# پێناسەی کتێب

ناوی کتێـــب : تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز

نوســــــەر: عەلی باپیر

نەخشەشازی ناوەوە: عزالدين محمد عمر

بـــــــەرگ : عزالدين محمد عمر

نۆرەو ساڵی چاپ: یەکەم ١٤٣٣- ٢٠١٢

تـــــــیراژ : ١٠٠٠ دانە

له بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانەکان ژمارەی سپاردنی (٧)ی ساڵی (٢٠١٢)ی پێ دراوە

# پێشەکی

الْحَمْدُ للهِ نَحْمَدُهُ وَنَسْتَعِينُهُ، وَنَسْتَغْفِرُهُ، وَنَعُوذُ بِاللَّهِ مِنْ شُرُورِ أَنْفُسِنَا، وَمِنْ سَيِّئَاتِ أَعْمَالِنَا، مَنْ يَهْدِهِ اللهُ فَلاَ مُضِلَّ لَهُ، وَمَنْ يُضْلِلْ فَلاَ هَادِيَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاّ اللهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسۡلِمُونَ ﴿١٠٢﴾ ﴾ آل عمران، ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ وَخَلَقَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا وَبَثَّ مِنۡهُمَا رِجَالٗا كَثِيرٗا وَنِسَآءٗۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِي تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلۡأَرۡحَامَۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيۡكُمۡ رَقِيبٗا ﴿١﴾ ﴾ النساء، ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَقُولُواْ قَوۡلٗا سَدِيدٗا ﴿٧٠﴾ يُصۡلِحۡ لَكُمۡ أَعۡمَٰلَكُمۡ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدۡ فَازَ فَوۡزًا عَظِيمًا ﴿٧١﴾ ﴾ الأحزاب.

أَمَّا بَعْدُ: فَإِنَّ أَصْدَقَ الحَدِيث كَلاَمُ اللهِ وَخَيْرَ الْهَدْيِ هَدْيُ مُحَمَّد ﷺ وَشَرَّ الأُمُورِ مُحْدَثَاتُها، وَكُلَّ مُحْدَثَةٍ بِدْعَة، وَكُلَّ بِدْعَةٍ ضَلاَلَةٌ، وَكُلَّ ضَلاَلَةٍ فِي النَّارِ[1].

**خوێنەرە بەڕێزو خۆشەویستەکان!**

**هیچ گومانی تێدانیە - بۆ مرۆڤی بڕوادار - کە ئەو تەمەنەی لە خزمەت دوایین کتێبی خوا (قورئان)دا بەسەردەبرێ، جا بە هەر شێوەیەك لە شێوەکانی لە خزمەتدابووندا بێ؛ خوێندنەوە، تێفکرینو ڕامان، فێرکردن، کارپێکردن ... هتد، بەباشترین جێگرتن جێگا دەگرێو خاوەنەکەی لە دنیاو دوارۆژدا لێی بەهرەمەندە.**

---

١) ئەوە پێی دەگوترێ: (خطبة الحاجة) کە پێغەمبەر ﷺ هاوەڵانی بەڕێزی فێردەکرد پێش هەر قسەیەکی گرنگ بیڵێن، وەك وتاری جومعەو داخوازییکردن (خِطْبة)و .. هتد، وە ئەم وتارە هەرکام لە: الترمذي: (١١٠٥)، والنسائي: (١١٠٤)، وابن ماجه: (١٨٩٢) وأحمد: (٣٧٢٠)، وطبراني: (٢٤١٤) هێناویانەو (مسلم)یش بەشێکی هێناوە.

منـیش كـە - وەك یاسـكردنی چاكەی خـوا (التحدّث بنعمة الله) دەیخەمـەڕوو- لەوەتی فامم كردۆتەوە، خوای بەبەزەیی و بەخشەر چاكەی لەگەڵ كردووم و، بە فەرمایشتی بەرزو بێ وێنەی خۆیەوە سەرگەرمی كردووم و، بەر لە تەمەنی بیست ساڵییەوە هیدایەتی داوم، كە قورئانی بەرێزو پێز لەبەر بكەم و، سەرقاڵیی خوێندنەوەی تەفسیرەكانی قورئان و تێوڕامانی ئایەتە پڕ بەرەكەتەكانیو، لێوردبوونەوەیان بم.

هەر بۆیەش تێكڕای كتێب و نامیلكەو وتارو دەرسەكانم، كەم و زۆر لەبەر ڕۆشنایی قورئان دابوون، كە دیارە هەر ئەمەش شتێكی سروشتییە؛ ئاخر ئایا ئیسلام بێجگە لە قورئان پاشان سوننەتی پێغەمبەر ﷺ، كە ئەویش هەر ڕوونكردنەوەی قورئان و چۆنیەتی جێبەجێكردن و كارپێكردنیەتی، شتێكی دیكەیە؟! بێگومان نەخێر.

ئنجا لەمێژ ساڵیش بوو كە براو خوشكانێكی دڵسۆزی نزیك و ئاشنام، داوایان لێدەكردم كە دەست بكەم بە دانانی تەفسیرو لێكدانەوەیەكی قورئان، هەتا لە ڕەمەزانی ساڵی (١٤٢٨)دا هاتە دڵمەوە، كە ناوی خوای لێبهێنم و دەست بەو كارە گەورەو گرنگە بكەم، بەڵكو وردە وردە بەپێی بوارو دەرفەت، هەرساڵە هەندێكی لێ ئەنجام بدەم، لەگەڵ سەرقاڵیی زۆرو جۆرو جۆراو جۆریشدا، هەتا دەرفەتێكی وام بۆ دەڕەخسێ كە بتوانم خێرایی تێدا بكەم و خۆمی بۆ یەكلایی (متفرّغ) بكەمەوەو، خوا پشتیوان بێ تەواوی بكەم، ئەگەر تەمەن بەبەریەوە مابێ.

سەرچاوەی دانانی ئەم تەفسیرو لێكدانەوەیەشم وێڕای سەرنجدانی زۆربەی ئەو تەفسیرانەی كە باون و دەستم پێیان گەیشتوە، بریتییە لە وردبوونەوەو تێوڕامانی خۆم لە خودی قورئان، چونكە بێگومان قورئان هەندێكی هەندێكی ڕوون دەكاتەوە: (القرآن یُفَسِّرُ بَعضُهُ بَعْضَاً)، پاشان سوننەتی پێغەمبەری خوا ﷺ، چونكە پێغەمبەری خواش ڕوونكەرەوە (مُبَیِّن)ی قورئانە، وەك خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿... وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ وَلَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٤٤﴾﴾ النحل، واتە: وە زیكرمان بۆ لای تۆ ناردۆتە خوار تاكو ئەوەی بۆ خەڵكی نێرراوەتە خوار، بۆیان ڕوون بكەیەوە، وە بەڵكو خۆشیان بیربكەنەوە.

ئومێدیشم وایە - بە یارمەتی خوای بەخشەر ﷻ - شایستەیی ئەوەم هەبێ تەفسیرو لێکدانەوەیەکی وا بۆ قورئان پێشکەش بە مسوڵمانانی کوردستان بکەم، کە لە قورئان بوەشێتەوەو مایەی بەهرەو سوودی خوێنەران بێ، بە تایبەتیش کە زیاتر لە سی (٣٠) ساڵە لەگەڵ قورئانی بەرزو مەزنو تەفسیرەکانیو کتێبەکانی سوننەتدا خەریکمو دەیان کتێبو بەرهەمی جۆراوجۆرم لە زۆربەی بوارەکانی زانستەکانی شەریعەتدا پێشکەش کردوون.

شایانی باسیشە کە ئەو بیستو دوو مانگ زیندانیی کرانەم لەلایەن ئەمریکاوە - لە (٢٠٠٣/٧/١٠ تاکو: ٢٠٠٥/٤/٢٨) - دەرفەتێکی گەورەو گرنگ بوو، بۆ زیاتر پێدا قووڵبوونەوەی کتێبی خوا تبارك و تعالى، وە بۆ پەیدابوونی تێگەیشتنی تایبەت لە بارەی زۆرێك لە ئایەتەکانی‌یەوە، ئەم ڕاستییەش لە کتێبی: (الإسلام كما يتجلّى في كتاب الله تعالى)دا زۆر دەرەوشاوەتەوە[1]، بەڵام هەڵبەتە ناڵێمو هیچکەسیش بۆی نیە بڵێ: کە ئەم تەفسیرەی من تێروتەواوە، چونکە وێڕای سنووردار بوونی تواناو بڕستم لە بەرانبەر کتێبی لە هەموو ڕوویەکەوە ڕەها (مطلق)و بێسنوور (لا محدود)ی خوادا، نەشمویستوە کە زۆر بەملاولادا بچمو بچمە نێو هەندێك وردەکارییەوە، کە یان من تێیدا پسپۆڕو شارەزا نیم، یان خوێنەر پێویستی پێی نیە، لە کاتێکدا دەیەوێ لە قورئان تێبگاتو بزانێ خوا تبارك وتعالى ڕاستەوخۆ چی پێ فەرمووە؟!

ئنجا هەر لێرەشەوە بە پێویستی دەزانم پڕ بە دڵ سوپاسی ئەو برا گەنجە ڕووح سووكو گورجو گۆڵو دڵسۆزە بکەم (حەزی نەکرد ناوی بهێنم)، کە هەڵسا بە نووسینەوەو هێنانە سەر کاغەزو، پاشان تایپکردنو دوایی پێدچوونەوەو هەڵەگیریی، سەرجەم ئەم زنجیرە دەرسە، کە لە ئەسڵدا لە شێوەی وتار (محاضرة)دا پێشکەش کراون، هەروەها هەڵسا بە (تخريج)ی سەرجەم دەقەکانی

---

١) ئەو کتێبە کە ئێستا بەرگی یەکەمی لە چاپخانەو ئەوانی دیکەشی لە ئامادەکران دان بۆ چاپ، سەرجەم هەشت بەرگو نزیکەی چوار هەزار (٤٠٠٠) لاپەڕەیەو، هەوڵم داوە بە گشتی تێیدا باسی سەرجەم لایەنەکانی ئیسلام بکەمو، تاکە سەرچاوەشم قورئان بووە، وێڕای دەقەکانی سوننەت کە لە هۆش (ذاكرة)دا بووون.

سوننەت، لە سەرچاوە متمانە پێکراوەکانەوەو، زەحمەتو ماندووبوونێکی زۆری بەم بەرگی یەکەمەوە - کە سەرجەم سوورەتی (البقرة) دەگرێتە خۆی - کێشاوە، خوا بە باشترین شێوە پاداشتی بداتەوەو، هەر صالحو ساغو سەلامەتو سەربەرزبێ[1]، لە خوای بەرزو بێهاوتاش داواکارم ئەو جۆرە گەنجو لاوانە لە کوڕان و کچان لەنێو گەلەکەماندا زۆر بکات.

شایانی باسیشە کە ئێمە لەم تەفسیرەماندا باسی بەش (جزء)ەکانی قورئانو دابەشکردنەکانی دیکەی وەك: - (حزب) - ناکەین، چونکە هەر سوورەتێك بۆخۆی شتێکی سەربەخۆیەو سەرجەم ئایەتەکانی وەك ئالقەکانی زنجیرێك پێکەوە پەیوەستن و، ئاشکراشە کە دابەشکرانی سەرجەم قورئان بۆ سی (٣٠) بەش (جزء) و شەست (٦٠) (حزب)، شتێکە لەلایەن زانایانەوە کراوە، بۆ ئاسانکاریی خوێندنی قورئان، دیارە ئێمە لە دابەشکردنی بەرگەکانی ئەم تەفسیرەشدا دیسان حیساب بۆ بەشەکان (أجزاء)ی ناکەین و بە گوێرەی سوورەتەکان بەرگەکانی دیاری دەکەین.

دوا قسەشم ئەوەیە کە:

ئەم تەفسیرە - وەك پێشتر گوتمان - لە ئەسڵدا بەشێوەی دەرس و وتار پێشکەش کراوە، بەڵام دواتر خۆم دووجار بە وردیی پێیدا چوومەوەو بەپێی پێویست دەستکاریی کردوە، دیارە هەموو دەرسێکیش بەناوی خواو ستایشی خوا ﷻ دەستی پێکردوە، بەڵام ئێمە لە سەرەتای دەرسەکانەوە ئەوانەمان لابردوە، بۆ زۆر دووبارە نەبوونەوەو، ئەو (خطبة الحاجة)یەی لە سەرەتای ئەم پێشکەییەوە هاتوە، لەجیاتی سەرەتای سەرجەم دەرسەکانە.

سُبْحَانَ رَبِّكَ رَبِّ الْعِزَّةِ عَمَّا يَصِفُونَ، وَسَلَامٌ عَلَى الْمُرْسَلِينَ، وَالْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ.

دووشەممە ٢٥ رجب ١٤٣٢

٢٠١١/٦/٢٧ هەولێر

---

١) ئەو برا دڵسۆزە ئێستاش پاش سوورەتی (آل عمران)، سەرگەرمی سوورەتی (النِّساء)ەو عەزمیشی جەزم کردوە، کە ئەگەر تەمەنمان بەردەوام بێ، هەتا کۆتایی ئەم تەفسیرە سەرگەرمی کارەکەی بێ.

## وتەیەك لەبارەی ئەم تەفسیرەوە[1]



الْحَمْدُ للهِ، نَحْمَدُهُ وَنَسْتَعِينُهُ، وَنَسْتَهْدِيه، وَنَسْتَغْفِرُهُ، وَنَتُوبُ إِلَيْهِ، وَنَعُوذُ بِاللَّهِ مِنْ شُرُورِ أَنْفُسِنَا، وَمِنْ سَيِّئَاتِ أَعْمَالِنَا، مَنْ يَهْدِه اللهُ فَلاَ مُضِلَ لَهُ، وَمَنْ يُضلِلْ فَلاَ هَادِيَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَن لاَ إِلَهَ إِلاّ اللهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، وَأَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسولهُ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلهِ وَصَحْبِهِ وَسَلَم تَسلِيمَا كَثِيراً.

لە خزمەت قورئان دابوون، واتە: لە خزمەت خوای پەروەردگار دابوون، کە نیعمەتو فەزڵێکە خوای بەخشەر بە هەموو کەسی ڕەوا نابینێ تا پێی ببەخشێ، وەك فەرموویەتی: ﴿...قُلۡ إِنَّ ٱلۡفَضۡلَ بِيَدِ ٱللَّهِ يُؤۡتِيهِ مَن يَشَآءُۗ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٞ ﴿٧٣﴾ يَخۡتَصُّ بِرَحۡمَتِهِۦ مَن يَشَآءُۗ وَٱللَّهُ ذُو ٱلۡفَضۡلِ ٱلۡعَظِيمِ ﴿٧٤﴾﴾ آل عمران، بۆیە ئینسان دەبێ هەوڵبدا، ئەو کەسەبێ کە شایەنی ئەو فەزڵە بێ، کە پڕە لە فەیزو بەرەکەتی خوای پەروەردگار، ئنجا ژیان لەژێر سێبەری قورئاندا بە فەهمو تێگەیشتنی مامۆستای زمان ڕەوان، جۆرە ژیانێکی تایبەتە...!

بەڕاستی تێگەیشتنی جەنابی مامۆستا بۆ کەلامی خوای قسە لەجێ، تام وچێژو لەززەتی تایبەتی هەیە، وە ئینسان وا هەست دەکات ئەو زانا بەڕێزە زۆر چاك لە ماناو مەبەستەکانی کەلامی خوای پەروەردگار گەیشتوە، وە ئومێدم وایە خوای بەخشەر ئەو بەختەوەرییەی بە منی داوە لەکاتی نووسینەوەی ئەم تەفسیرەدا، بە هەر کەسێکی تری بدات، کە دەیخوێنێتەوە.

---

١) ئەم وتەیە هی ئەو برا گەنجە دڵسۆزەیە، کە وەك ئامازەم پێدا هەڵساوە بە ئەرکێکی زۆر، لە ئامادەکردنی ئەم بەرگی یەکەمەی ئەم تەفسیرەدا.

وە داواکارم لە خوای بەخشەر تەمەنی جەنابی مامۆستا درێژبکا بۆ تەواوکردنی تەفسیری کەلامەکەی‌و، چەندین کاری گەورەی تر، کە جەنابی مامۆستای بۆ ئامادە کردوە.

بێگومان من لەو ماوەی، کە خەریکی نووسینەوەی ئەم تەفسیرە بووم جۆرە ژیانێکی تایبەت ژیاوم ! وە هەمیشە هەستم بە بەرەکەتی کات کردوە، بۆ نموونە: جاری وا هەبوو دە (١٠) کاتژمێر دەمنووسییەوەو بە هیچ شێوەك هەستم بە ماندووبوون نەدەکرد، تەنیا ئەوە نەبێ، کە سەیری پەنجەم دەکرد، دەمبینی خواربووەتەوە بەهۆی ئەو قەڵەمەوە کە پێی دەمنووسی، ڕۆژێك بە جەنابی مامۆستام گۆت: مامۆستا من ئەوەندە زۆر دەنووسم، هیچ هەست بە ماندووبوون ناکەم؟! باسی خواربوونی پەنجەکەشم بۆ کرد!

جەنابی مامۆستا خەندەکی هاتە سەر لێوی‌و فەرمووی: کاکە (.....) ئەوە بەرەکەتە بەرەکەت! خوای پەروەردگار دەستی گرتووی، جا ئەوەی ڕاستیی بێ من تا ئەو کات نەمدەزانی بەرەکەت یانی چی؟! بۆیە هەستیشم بەو بەرەکەتە نەکردبوو، وە زۆربەی جارەکان لەبەر لەززەت‌و خۆشییەکانی تێگەیشتنم لە مەبەستەکانی قورئانی بەپێز، نان‌و چام لە پێش سارد دەبۆوە، زۆرجار شەوان نەدەنووستم‌و خەویشم نەدەهات، واتە: هەستم بەوە نەدەکرد کاتی خەوە ... ئەوەی ڕاستیی بێ ناتوانم وەك پێویست باسی خۆشییەکانی ئەو کاتانە بکەم، کە لەگەڵ مامۆستا لە خزمەت سوورەتی (البقرة) دابووین، وە ئەو کاتانەش دڵنیام دووبارە نابنەوە، مەگەر ئەو کاتەی کە دەست بە نووسینەوەی تەفسیری سوورەتی (آل عمران)و سوورەتەکانی تری قورئان دەکەین، کە إِنْ شَاءَ اللّٰهَ هەموو قورئان تەواو دەکەین.

لە کۆتاییدا دەمەوێ ئاماژە بە هاوکاری چەند برایەك بکەم، کە لەگەڵیان (تایپ) کردم دوای ئەوەی خستبوومە سەر کاغەز، خوا پاداشتیان بداتەوەو تەرازووی چاکەکانیان گران بکات، شایانی باسیشە کە زیاتر لە چوارجار پێداچوونەوەم بۆ

ئـەم تەفـسیرە كـردوەو، خوێندوومەتـەوەو هەڵەچـنینم بـۆ كـردوە، وە چـاك تێیگەیشـتووم بۆیە لە سەرەتادا شایەدیی تایبەتبوونی ئەم تەفسیرەم دا.

خـوای پـەروەردگار بـە لوتـفو كـەرەمی خـۆی لـەو كەسـانەمان بگێـڕێ، كـە شـایستەیی ئـەوەیان تێدایـە لـە خزمـەت كەلامـە بـەرزو بەڕێزەكـەی ئـەو دابـن‌و، بمانڕازێنێتـەوە بـەو سـیفەتە بەرزانـەی، كـە بەهۆیانـەوە ئینـسانەكان لـەلای ئـەو خۆشەویست دەبن.

والحمدُ للّٰهِ رَبِّ العالـمين.

گەنجێك

٥/ شعبان/١٤٣٢ ه

هەولێر

# ڕێ خۆشکردن

الحَمـد لله رَبّ العَالـمَين وَصَلّى الله تعَالَى وَسَلَمَ وَبَارَكَ عَلَى سَيّدِ المرسَلين وَخاتمَ النبيّين مُحَمَّد وآلِهِ أجمَعين من الصَّحبِ والأزواج والقرابة وَالتابعينَ لَهم بإحسَان إلى يَومِ الدّين .

بەڕێزان !

خـوا پـشتیوان بـێ لـەمڕۆ بـەدواوە، کـە ئـەمڕۆ یـەکی ڕەمـەزانی سـاڵی (١٤٢٨)ی کۆچـییە، ئەوەنـدەی دەرفـەتمان بـێ، زنجـیرە دەرسـێك دادەمـەزرێنین، لـەژێر ناوونیشانی زنجیـرە دەرسی: (تەفـسیری قورئـانی بـەرزو بـەپێز)دا، ئاشکراشـە لـە خزمەت قورئان دابوون، واتە: لە خزمەت خـوای پـەروەردگار دابـوون، وە پاشـانیش لـە خزمـەت پێغەمبـەر ﷺ دابـوون، خـوا کـە بـۆ خـۆی قورئـانی فـەرمووە، وە پێغەمبـەریش ﷺ کـە لێـی وەرگرتـوە، دوای ئـەوەی کـە خـوای کاربـەجێ بـە جوبرائیلدا بۆی نـاردوە، یەکـەمین دڵێـك کـە قورئـانی بـۆ سـەر نـازڵ بـووە، دڵو دەروونـی موبـارەکی پێغەمبـەری خاتـەم بـووە، وە لـە خزمـەت قورئـان دابـوون لـە ڕاسـتیدا شـانازییەکە خـوای بەخـشەر بـە هـەموو کەسـی ڕەوا نابینـێو خێـرو نیعمەتێکە شایستەی هەموو کەس نیە، بۆیە ئێمە ئەگەر خوا یارمەتیمان بدات بە هەر شێوەیەك لە شێوەکان لە خزمەت قورئان دابین، دەبێ هەست بەوە بکەین، کە خوای بێوێنە، نیعمـەتو چاکەیەکی زۆر گـەورەی لەگەڵمانـدا کـردوە، وە دەبـێ لـە خوا بپاڕێینەوە: خوایە وامان لێبکەی کە شایستەی ئەوە بین ئەو نیعمەتەمان تێدا بەردەوام بێو وە شوکرو سوپاسی ئەو نیعمەتە بەجێبێنین.

شایانی باسیشە کە بۆ پێشکەش کردنی ئەم زنجیرە دەرسـە: (تەفـسیری قورئانی بـەرزو بەپێـز) سـوود لـە ژمارەیـەکی زۆر لـە تەفـسیرەکانی قورئـان وەردەگـرم کـە گرنگتـرینیان ئەمانەن:

١- جامع البيان في تأويل القُرآن، الطّبَرِي.

٢- تفسير القُرآن العظيم، ابن كثير.

٣- الجامع لأحكام القُرآن، القُرطُبي.

٤- التفسير الكبير أَو مفاتيحُ الغَيب، فَخْرَالدِّين الرازي.

٥- فتح القدير، الشوكاني.

٦- محاسن التأويل، القاسمي.

٧- في ظِلال القُرآن، سيد قطب.

٨- تفسير المنار، رشيد رضا.

٩- صفوة التفاسير، الصابوني.

١٠- تفسير الكريم الرحمن في تفسير كلام المْنان، عبدالرحمن بن ناصر السعدي.

١١- مُفرَدات ألفاظ القُرآن، راغب الأصفهاني.

شایانی باسە وێڕای ئەم تەفسیرانە سوودم لە چەند تەفسیرو سەرچاوەی دیکەش وەرگرتوە، کە لە کۆتاییدا بەگشتی ئاماژەیان پێدەکەین.

هەڵبەتە وێڕای وردبوونەوەو ڕامانو تێگەیشتنی خۆیشم.

دیارە بۆ شیکردنەوەی وشەکانی قورئانیش، بە شێوەیەکی بنەڕەتییو بە پلەی یەکەم پشت بە کتێبەکەی (راغب الأصفهاني) دەبەستم، بەڵام جاروبار سوود لە هەندێك لە فەرهەنگەکانی زمان عەرەبیش وەردەگرم، بە تایبەت (المعجم الوسيط).

ئنجا کە لێرە سەرچاوەکانی ئەم زنجیرە دەرسەم خستەڕوو، بە پێویستی نازانم هەمیشە ئاماژەیان پێ بکەمەوە، مەگەر لە هەندێك حاڵەتی تایبەتیدا کە پێویست بکات، لەکاتی خواستنەوە (إقتباس)ی دەقی یەکێکیاندا، کە ئەوکاتە بە بەرگو لاپەڕەوە ئاماژەیان پێ دەکەین.

## چۆنیەتی و نەخشەی تەفسیرکردنی سوورەت و ئایەتەکان

ئەو نەخشەیەی کە من دامناوە بۆ تەفسیرکردنی قورئان، بۆ حەوت قۆناغ دابەش بووە، بەمجۆرە:

١ – پێناسەکردنی سوورەتەکە یان ئەو کۆمەڵە ئایەتە، کە دەرسەکە پێکدێنن، بە کورتیی ڕوونی دەکەینەوە، کە لە چ بابەتێك دەدوێن و تەوەرەکانیان چین؟!

٢ – نووسین و خستنەڕووی ئەو کۆمەڵە ئایەتە کە دەویسترێ لەو دەرسەدا بتوێژرێنەوە.

٣ – مانای وشە بە وشەی ئایەتەکان بەکورتیی و پوختیی.

٤ – شیکردنەوەی ئەو وشانەی حەوجێی شیکردنەوەو ڕوونکردنەوەی زیاترن و، ساغکردنەوەی مانا بنەڕەتییەکەیان.

٥ – باسکردنی هۆی هاتنە خوارەوە (سبب النزول)، ئەگەر هەبێ.

٦ – مانای گشتی ئایەتەکان، واتە تەفسیرکردن و ڕوونکردنەوەی ئایەتەکان بەسەریەکەوەو بەگشتی.

٧ – خستنە ڕووی مەسەلە گرنگەکان، واتە هەر مەسەلەیەك کە نەگونجابێ وەك پێویست تیشکی بخرێتە سەر، لەم قۆناغی حەوتەمەدا دەیتوێژینەوەو بۆی قەرەبوو دەکەینەوە، جا چ پەیوەندی بە لایەنی فیکرو عەقیدەوە هەبێ، چ بە لایەنی حوکم و سیاسەتەوە، چ بەلایەنی سیرەو مێژووەوە، ... هتد.



# دەرسی یەكەم

## چەند زانیارییەك لەبارەی قورئانەوە

## پێناسەی ئەم دەرسە

لەم دەرسی یەكەمەدا یازدە بابەت دەخەینەڕوو، كە وەك پێشەكیو ڕێخۆشكردن وان، بۆ ناسینی قورئانو لێتێگەیشتنیو مامەڵەی ڕاستو دروست لەگەڵ كردنی[١]، هەڵبەتە زۆر بە كورتییو گوشراویی:

**یەكەم: قورئان چییە؟**

وشەی (قرآن) قورئان لەسەر وەزنی (فُعلاَن) بە مانای (مَقْرُوْ)، واتە: خوێنراوە، دێ، دەگوترێ: (قَرَأَ يَقرَأُ قُرآناً)، وە دەشگونجێ بەمانای (قراءة) خوێندنەوەش بێت، وەك خوای زاناو توانا دەفەرموێ: ﴿ فَإِذَا قَرَأْنَٰهُ فَٱتَّبِعْ قُرْءَانَهُۥ ﴿١٨﴾ ﴾ القيامة، واتە: (فإذا تَلوناهُ فاتَّبِع تلاوتَهُ): هەركات خوێندمانەوە شوێن خوێندنەوەكەی بكەوە، ئەوە ئەگەر (قُرْآن) چاوگ (مَصْدَر) بێ، ئەگەر ناو (إسم)یش بێ، ئەوە ناوە بۆ قورئان، واتە: (مَقْرُوْ) خوێندراو، جا خوا ﷻ ئاوا پێناسەی قورئانمان بۆ دەكاتو لە سووڕەتی (الشعراء)دا دەفەرموێ: ﴿ وَإِنَّهُۥ لَتَنزِيلُ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٩٢﴾ نَزَلَ بِهِ ٱلرُّوحُ ٱلْأَمِينُ ﴿١٩٣﴾ عَلَىٰ قَلْبِكَ لِتَكُونَ مِنَ ٱلْمُنذِرِينَ ﴿١٩٤﴾ بِلِسَانٍ عَرَبِيٍّ مُّبِينٍ ﴿١٩٥﴾ ﴾، ئەوە پێناسەیەكی زۆر كورتو پوختە كە خوای بەرزو مەزن پێناسەی كتێبو فەرمایشتی خۆی پێ دەكات، دەفەرموێ: ﴿ وَإِنَّهُۥ لَتَنزِيلُ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾، واتە: بێگومان

---

١) واباشە سەرنجی كتێبی: (ئەركی سەرشانمان بەرانبەر قورئان) بدرێ، هەروەها كتێبی: (چۆن باشتر لە قورئان بەهرەمەند دەبین؟)، كە هەردووكیان هی بەندەنو لە لایەن سەنتەری (حیكمە)وە چاپو بڵاوكراونەوە.

ئەم كتێبە (نێرراوە خوار)ی پەروەردگاری جیهانییانە، ئەم ئایەتە سەرچاوەی لێوە هاتنی قورئان دیاری دەكات كە كێیە؟ كە پەروەردگاری جیهانییانەو خاوەنی جیهانەكانە، ئەویش (خوا)یە ﷻ.

ئنجا ئایا كێ هێناویەتیو ئەو پەیكەو ئەو پەیامبەرەی كە لەلای خواوەو لە ئاسمانەوە بۆ سەر زەوی هێناویەتی، كێیە؟ ﴿ نَزَلَ بِهِ ٱلرُّوحُ ٱلْأَمِينُ ﴾، واتە: (ٱلرُّوحُ ٱلْأَمِينُ) هێناویەتە خوار بۆ سەر دڵی تۆ، كە مەبەست جوبرائیلە ﵇، چونكە خوا لە قورئاندا جوبرائیلی بە (روح) ناوهێناوە، وەك فەرموویەتی: ﴿ يَوْمَ يَقُومُ ٱلرُّوحُ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةُ صَفًّا ﴿٣٨﴾ ﴾النبأ، وە بە (الروح الأمین)یش ناوی هێناوە وەك لە سوورەتی (الشعراء)دا هاتوە، وە بە (جبریل)یش ناوی هێناوە، وەك لە سوورەتی (البقرة)دا هاتوە: ﴿ قُلْ مَن كَانَ عَدُوًّا لِّجِبْرِيلَ فَإِنَّهُۥ نَزَّلَهُۥ عَلَىٰ قَلْبِكَ بِإِذْنِ ٱللَّهِ ...﴿٩٧﴾ ﴾ البقرة، وە بە (الروح القدس)یش ناوی هێناوە . وەك لە سوورەتی (النحل)دا فەرموویەتی: ﴿ قُلْ نَزَّلَهُۥ رُوحُ ٱلْقُدُسِ مِن رَّبِّكَ ...﴿١٠٢﴾ ﴾، جا دیارە وشەی: (روح) ناوی جوبرائیلەو بە هەركام لە (الأمین) واتە: ئیماندارو دەستپاك، وە (القدس) واتە: پاك و پیرۆز، وەسف كراوە، وشەی (قَلْب)یش لە قورئاندا هەم بە مانای دڵو هەم بە مانای عەقڵیش دێ، بەڵام كە دەڵێین: وشەی (قَلْب) بە مانای دڵ دێ، نەك ئەو دڵە گۆشتینە كە دەیزانین، بەڵكو ئەو دڵە مەعنەوییەی، كە پەیوەندی هەیە بەو دڵە گۆشتینەیەوە كە لەلای چەپی سینەدا هەیە، ئنجا (قَلْب) ئەگەر مانای دڵی مەعنەویی پەیوەست بە دڵی گۆشتینی نێو سینەی لێ بگیرێ، واتە ئەو هێزەی كە ئینسان شتی پێ قبووڵ یاخود ڕەفز دەكا، وە شتی پێ خۆشدەوێ یان دەیبوغزێنێ، واتە چەقی ئیرادەو خواستنو ویستن. وە ئەگەر مەبەستیش پێی عەقڵ بێت، واتە: ئەو شتەی كە ئینسان شتەكانی پێ دەرك دەكاتو كەشف دەكات.

ئنجا قورئان بۆچی نێرراوە؟ ﴿ لِتَكُونَ مِنَ ٱلْمُنذِرِينَ ﴾، واتە: ئامانج لە نێررانی قورئان ئەوەیە، كە تۆ لە ورياكەرەوان بی، وە هۆشیاركەرەوەی خەڵكی بی، وەك هەموو پێغەمبەرانی دیكە (علیهم الصلاة والسلام)، ئنجا ئایا قورئان بە چ زمانێك نێرراوە؟

﴿ بِلِسَانٍ عَرَبِيٍّ مُّبِينٍ ﴾، واتە: ئەم قورئانە بە زمانێكی عەرەبی ڕوونو ئاشكرای بێ گرێو گۆڵ هاتوە.

زانایانیش ئاوا پێناسەی قورئانیان كردوە: ((القُرآن: هُوَ كَلاَمُ اللهِ المُعجِز المُنَزَّلُ عَلَى النَبِيّ مُحَمَّد ﷺ المَكتُوبُ في المَصَاحِف، المَنقُولُ عَنْهُ بالتَّوَاتُر، المُتَعَبَّدُ بتِلاَوَتِهِ)). وەك دكتۆر (صُبحي الصالح) لە (مَباحث في علُوم القُرآن)دا[1] هێناویەتیو دەڵێ: ئەم پێناسەیە هەموو زانایان لەسەری یەك دەنگن. واتە: قورئان ئەو فەرمایشتە دەستەوسانكەرەیە، كە دابەزیوە بۆ سەر موحەممەد پێغەمبەری خوا ﷺ، كە لە موصحەفەكاندا نووسراوە، كە بەشێوەی تەواتور لە پێغەمبەرەوە ﷺ گواستراوەتەوە، خوێندنەوەكەی خواپەرستییە.

(تەواتور)یش: ئەوەیە كە كۆمەڵە كەسێك شتێك بگوازنەوە لە سەرچاوەیەكو، ئەوانیش بیگوازنەوە بۆ كۆمەڵێكی دیكەو، ئەوانیش بیگەیەننە كۆمەڵێكی دی... تاكۆتایی، كۆمەڵێكی وا كە هیچ عەقڵێ ڕێگا نادات بڵێ: ئەوانە لەسەر درۆ كۆدەبنەوە[2].

دووەم: ناوەكانی قورئان:

قورئان چوار ناوی سەرەكی هەن:

---

١) ص (٢١).

٢) المتواترُ: اسم فاعلِ مُشتق من التواتر وهُوَ التتابع قالَ تعالى: ﴿ ثُمَّ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا تَتْرَا ... ﴿٤٤﴾ ﴾ المؤمنون، أي واحداً بَعد واحد، واصطلاحاً ما رَوَاهُ جماعة في كُل طبقة من طبقات السَّنَد تُحيلُ تواطؤهم وتوافقهم على الكذب واستندوا إلى أمرٍ مَحسوس. (الجداول الجامعة)، ص(٤٦٢) الشيخ الدكتور: جاسم بن محمد بن مُهلهل الياسين و نخبة من طلبة العلم.

خوای زاناو شارەزا قورئانی بە چوار ناو ناوزەد کردوە، بەڵام دیارە بە چەندان وەسف وەسفی کردوە، جا چوار ناوەکانی قورئان بریتین لە:

١- القرآن: وەك خوای بێ وێنە دەفەرموێ: ﴿إِنَّهُۥ لَقُرۡءَانٞ كَرِيمٞ ٧٧ فِي كِتَٰبٖ مَّكۡنُونٖ ٧٨ لَّا يَمَسُّهُۥٓ إِلَّا ٱلۡمُطَهَّرُونَ ٧٩ تَنزِيلٞ مِّن رَّبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ٨٠﴾ الواقعة، واتە: بێگومان ئەمە قورئانێکی بەڕێزە (یاخود قورئانێکی بەخشندەیە)، وشەی (کریم) هەم بە مانای (بەڕێز) دێ، هەم بە مانای (بەخشندە) دێ.

٢- الكتاب: ناوی دووەمی قورئان بریتیە لە (کتاب) وەك لە چەندان شوێندا خوای بێهاوەڵ بە (کتاب) ناوی هێناوە، بۆ وێنە لە سوورەتی (البقرة)دا، کە دەفەرموێ: ﴿الٓمٓ ١ ذَٰلِكَ ٱلۡكِتَٰبُ لَا رَيۡبَۛ فِيهِۛ هُدٗى لِّلۡمُتَّقِينَ ٢﴾، واتە: ئەو کتێبە گومانی تێدا نیە ڕێنماییکەرە بۆ پارێزکاران. ئنجا قورئان وەك گوتمان واتە: خوێندراوە. ئەدی (کتاب) یانی چی؟

(کتاب) واتە: نووسراو یان نووسراوەو ئەسڵی وشەی (کتاب)یش لە (کَتَبَ)وە هاتوە یانی: (جَمَعَ) کۆی کردەوە، چونکە پیتو وشەکان کۆدەکرێنەوە.

٣- الذكر: ناوی سێیەمی قورئانە، وەك خوای بەبەزەیی لە سوورەتی (الحجر)دا دەفەرموێ: ﴿إِنَّا نَحۡنُ نَزَّلۡنَا ٱلذِّكۡرَ وَإِنَّا لَهُۥ لَحَٰفِظُونَ ٩﴾ الحجر، واتە: ئێمە خۆمان زیکرمان ناردۆتە خوارێو هەرخۆشمان پارێزەرینی.

جا ئایا (ذکر) یانی چی؟ واتە: بیرخەرەوە، چونکە قورئان ئیمان دەخاتەوە بیر ئینسان، هەروەها هەموو ئەو ڕاستییانەی کە لەگەڵ سروشتو فیطرەتی ئینساندا تێکهەڵکێشراونو لێیان بێئاگا دەبێ، دەیانخاتەوە بیری.

٤- الفرقان: ناوی چوارەمی قورئان (فرقان)ە، وەك خوای ﷻ فەرموویەتی: ﴿تَبَارَكَ ٱلَّذِي نَزَّلَ ٱلۡفُرۡقَانَ عَلَىٰ عَبۡدِهِۦ لِيَكُونَ لِلۡعَٰلَمِينَ نَذِيرًا ١﴾ الفرقان، (فرقان)یش واتە: هەر شتێ کە: هەقو ناهەق، حەڵاڵو حەرام، چاكو خراپ،

ڕاستیو درۆ... هتد، لە یەك جیاكاتەوەو فەسڵیان بكات، قورئان ئەو چوار ناوەی هەیە كە وەك ناوی پێناسران (الإِسم العَلَمْ) بۆی بەكارهێنرابن لە قورئاندا.

سێیەم: سیفەتەكانی قورئان:

خوای پەروەردگارلە كتێبی خۆیدا، بە زۆر وەسف پێناسەی قورئانی كردوە، كە بەزەحمەت دەگونجێ ئینسان سەرژمێری هەموویان بكات، بەڵام ئەوانەی كە زۆر بەرچاوو گرنگن من هێناومن، كە بریتین لە:

١- (العَظِيم) واتە: مەزن وەك، لە سووڕەتی (الحجر)دا دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَٰكَ سَبْعًا مِّنَ ٱلْمَثَانِى وَٱلْقُرْءَانَ ٱلْعَظِيمَ ﴿٨٧﴾ ﴾، واتە: بێگومان ئێمە حەوت لە دووبارە كراوەكانمان بە تۆ بەخشیوە (ئەی موحەممەد)، وە قورئانی مەزنیشمان پێ بەخشیوی، زۆربەی توێژەرانی قورئان ئەگەر نەڵێین هەموویان دەڵێن: مەبەست لە ﴿ سَبْعًا مِّنَ ٱلْمَثَانِى ﴾، سووڕەتی فاتیحەیە، كە حەوت ئایەتی تێدان و زۆر جار دووبارە دەبنەوە، وە مەبەست ﴿ وَٱلْقُرْءَانَ ٱلْعَظِيمَ ﴾یش هەموو قورئانەو لە نێویدا سووڕەتی فاتیحەش، وە دیارە خوا ﷻ چەندە خاوەنی مەزنیی و عەزەمەتە، فەرمایشتەكەیشی لە قەدەر خۆیەتی.

٢- (الكَرِيم) واتە: بەرێز یان بەخشندە، وەك لە سووڕەتی (الواقیعة)دا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّهُۥ لَقُرْءَانٌ كَرِيمٌ ﴿٧٧﴾ ﴾، (كَریم)یش لە كەرەمەوە هاتوە، واتە: بەخشندەیی یاخود ڕێز، وە لە واقیعیشدا قورئان هەم خاوەن ڕێزو حورمەتی زۆرگەورەیەو، هەم زۆریش بەخشندەیە، زۆر بەرێزە چونكە دیارە خوای بێ هاوتا بۆ خۆی (ذو الجلال والإكرام)ە، ئنجا قورئانێك لەلای خوای خاوەن ڕێزەوە هاتبێ، دیارە هەر بەرێزە، وە قورئان زۆریش بەخشندەیەو بەڕاستی هەركەسێ لە قورئاندا نزیك بێ، زۆری پێ دەبەخشێ، چونكە زۆر سەخییە.

٣- (العَلي) واتە: بەرز.

٤- (الحَكِيم) واتـە: كاربەجێو قسە لەجێو كارامە، وەك لە سوورەتی (الزخرف)دا دەفەرموێ: ﴿ وَإِنَّهُۥ فِىٓ أُمِّ ٱلْكِتَٰبِ لَدَيْنَا لَعَلِىٌّ حَكِيمٌ ﴿٤﴾ ﴾، واتە: قورئان لە ئەسڵی كتێبدا {كە مەبەست پێی (لوح المحفوظ)ە، ئەو شتەی كە خوا هەموو زانیاری خۆی تێدا تۆمار كردوە، كە هەرخوای پەروەردگار بۆخۆی دەزانێ چییەو چۆنە؟} بەرزەو كاربەجێیە، وە بە دڵنیایی یەوە هەركەسێ لە قورئانەوە نزیك بێو هۆگری قورئان بێ، قورئان بەرزی دەكاتەوەو حیكمەتو دانایی و وەستاییو كارامەیی پێ دەبەخشێ.

٥- (العَزِيز) واتە: زاڵو باڵادەست، وەك لە سوورەتی (فصلت)دا دەفەرموێ: ﴿ .... وَإِنَّهُۥ لَكِتَٰبٌ عَزِيزٌ ﴿٤١﴾ ﴾، واتە: ئەم كتێبە كتێبێكی زاڵ و باڵادەستە، (راغب الأصفهاني) دەڵێ: (العَزِيزُ مَن كَانَ مَمنوعُ الجَانِب) واتە: عەزیز، كەسێكە خەڵك زەفەری پێ نەبا، خەڵك پێی نەوێرێو نەتوانن بەسەریدا زاڵ بن، قورئانیش كتێبێكی عەزیزەو هیچ كەسێك نەك هەر خۆی لە قەرەنادا، بەڵكو تۆزی ڕێشی ناشكێنێ، وە هیچ كەسێك نەك هەر نەیتوانیوە، كە وەڵامی تەحەدداكانی بداتەوە، بەڵكو لە بەرانبەریدا دەستەوسانو دەستە ئەژنۆ دانیشتوە، وە قورئان عەزیزەو هەركەسێك بەڕاستی لێی نزیك بێ عیززەتی پێ دەبەخشێ، وە هەر میللەتێك ڕوو لە كتێبی خوا بكات، عیززەتی بۆ دەڕەخسێنێ.

٦- (المُبَارَك) واتە: خاوەن پێز، وەك لە سوورەتی (ق)دا خوا كاربەجێ دەفەرموێ: ﴿ وَنَزَّلْنَا مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً مُّبَٰرَكًا ... ﴿٩﴾ ﴾، واتە: وە لە ئاسمانەوە ئاوێكی موبارەكمان ناردۆتە خوار، (واتە: ئاوێكی بەپێز) باران بە پێزە شت دەڕوێنێ، هەروەها قورئانیش بە پێزو بە بەرەكەتە، وشەی موبارەك ئەوە ماناكەیەتی، واتە: خاوەن بەرەكەتو پێزو بەرهەم، لە كوردەواریی خۆماندا وشەی موبارەك بەكاردێت بۆ (شتی موتفەڕكو پیرۆز) كە ئەوە مانای وشەی (مقدّس)ە، بەڵام موبارەك جیایە، وە خوای زانا لە قورئاندا كتێبی خۆی بە موقەددەس ناو نەناوە،

بەڵكو بە موبارەكی ناوناوە، وە ئەوە جوولەكەو نەصرانییەكانن بەكتێبی خۆیان دەڵێن: كتێبی پیرۆز (الكتاب المقدّس)، خوای كاربەجێ لە سوورەتی (ص)دا دەفەرموێ: ﴿ كِتَٰبٌ أَنزَلۡنَٰهُ إِلَيۡكَ مُبَٰرَكٞ لِّيَدَّبَّرُوٓاْ ءَايَٰتِهِۦ وَلِيَتَذَكَّرَ أُوْلُواْ ٱلۡأَلۡبَٰبِ ﴿٢٩﴾ ﴾، واتە: ئەم كتێبە كتێبێكە بۆ تۆمان ناردوە موبارەكە (یانی: خاوەن بەرەكەتو پێزەو بەرهەمو پیزو بەرەكەت لە ژیانی ئینساندا پەیدا دەكات)، تاكو لە ئایەتەكانی وردبنەوەو بۆئەوەی خاوەن عەقڵان پەندی لێوەربگرن.

٧- (المُهَیمِن) واتە: چاودێرو بەسەر ڕاگەیشتووو كۆنترۆڵكەر، وەك خوای بەبەزەیی لە سوورەتی (المائدة)دا دەفەرموێ: ﴿ وَأَنزَلۡنَآ إِلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ بِٱلۡحَقِّ مُصَدِّقٗا لِّمَا بَيۡنَ يَدَيۡهِ مِنَ ٱلۡكِتَٰبِ وَمُهَيۡمِنًا عَلَيۡهِ .... ﴿٤٨﴾ ﴾.

٨- (المُصَدِّق) واتە: بەڕاست دانەر، وەك خوای بێ هەڵەوپەڵە لە سوورەتی (المائدة)دا دەفەرموێ: ﴿ وَأَنزَلۡنَآ إِلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ بِٱلۡحَقِّ مُصَدِّقٗا لِّمَا بَيۡنَ يَدَيۡهِ مِنَ ٱلۡكِتَٰبِ وَمُهَيۡمِنًا عَلَيۡهِ ... ﴿٤٨﴾ ﴾، واتە: كتێبمان بۆ تۆ ناردۆتە خوار بە هەق، كتێبەكانی پێش خۆی بەڕاست دەزانێو بەسەریشیانەوە چاودێرە، [بەڕاستیان دەزانێ، یانی: هەركام لە (صحف)ی ئیبراهیم و (توراة)ی مووساو (زبور)ی داوودو (إِنْجِیل)ی عیسا (علیهم الصلاة والسلام)، وە باقی كتێبەكانی دیكەی، كە بۆ پێغەمبەران هاتوونو ناویان نەهاتوە، قورئان دەفەرموێ: ئەسڵەكەیان ڕاستەو هەمووی لە خواوەیە]، بەڵام (وَمُهَيۡمِنًا عَلَيۡهِ ) بەسەریانەوەش چاودێرە، ئەگەر دەستكاریی كرابنو غەڵەتو پەڵەتیان تێدا پەیدابووبێ، كە بێگومان دەستكاریی كراون، ڕاستیان دەكاتەوە، دیارە بە گەلێ وەسفی دیكەش خوای پەروەردگار قورئانی وەسف كردوەو لە ڕاستیدا وەسفەكانی قورئان تەواو نابن، وە ئێمە ئەگەر بمانەوێ قورئان وەسف بكەین وەسفەكانی بێسنوورنو قورئان بێ كۆتایی وەسفی چاكی هەن، وەك چۆن خوای پەروەردگار بەبێ كۆتایی سیفەتی بەرزو چاكی هەن، فەرمایشتەكەیشی وەك خۆیەتی. هەمیشە ئەوەتان

لەبیربێ، کە فەرمایشتی خواو کتێبی خوا ﷻ لەقەدەر خوای بەرزو مەزنە، وەك چۆن خوا خاوەنی هەموو سیفەتێکی بێسنوورە، بۆ وێنە: (وللهِ المَثَلُ الأَعلَى) ئینسان هەتا چەند مەترێك بەروونیی دەبینێ، چەند کیلۆمەترێکیش بە لێڵیی دەبینێ، بەڵام خوا ﷻ بەبێ کۆتایی شت دەبینێ، وە وەك خۆی دەیبینێ، ئینسان هەندێ شت دەبینێو زۆرشت نابینێ، بەڵام خوا ﷻ هەموو شتێ دەبینێ، وە ئینسان هەندێ شت دەزانێ زۆرشت نازانێ، بەڵام خوا ﷻ هەموو شت دەزانێ، وە ئینسان هەندێ شت دەتوانێو زۆر شت ناتوانێ، بەڵام خوا ﷻ هەموو شتێ دەتوانێ ... بەهەمان شێوە فەرمایشتی خوای پەروەردگار (واتە: قورئان) لە قەدەر خوایە ﷻ.

چوارەم: ئامانجی نێررانی قورئان، ئایا قورئان بۆچی نێرراوە؟

خوای پەروەردگار لە زۆر شوێن لە قورئاندا باس دەکات، کە قورئانی بۆچی ناردوە؟ بۆ وێنە: لە سوورەتی (الإسراء)دا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانَ يَهْدِى لِلَّتِى هِىَ أَقْوَمُ وَيُبَشِّرُ ٱلْمُؤْمِنِينَ ٱلَّذِينَ يَعْمَلُونَ ٱلصَّٰلِحَٰتِ أَنَّ لَهُمْ أَجْرًا كَبِيرًا ﴿٩﴾ ﴾، واتە: بێگومان ئەم قورئانە ڕێنمایی دەکات بەرەو ڕاستترینو چاکترین، لێرەدا خوای زانا نەیخستۆتە ڕوو (يَهدي) کێ؟ یانی: بەرکار (مَفعُول)ی (يهدي) کێیە؟ (يَهدي الناس)، (يَهدي الإنسان)، (يَهدي الجن)، (يَهدي المُسلمين)...؟ واتە خوای پەروەردگار بەرکار (مَفعُول)ەکەی بە (مَحْذوف)ی هێشتۆتەوە بۆئەوەی هەموو کەسێك بگرێتەوە لە هەموو حاڵاندا، پیاوو ئافرەتو، پیرو گەنجو، خوێندەوارو نەخوێندەوار، بەدەستەڵاتو بێدەستەڵات، دەوڵەمەندو هەژار، هەموویان دەگرێتەوە، ئنجا قورئان خەڵکی بۆچی ڕێنمایی دەکات؟ ﴿ لِلَّتِى هِىَ أَقْوَمُ ﴾، توێژەرەوانی قورئان دەڵێن: ( لِلَّتِى ) لێرەدا ئاماژەیە بۆ شتێکی (مَحذوف) وەك (للطريقة التي) بۆ ڕێبازێك، کە ﴿ هِىَ أَقْوَمُ ﴾، لە هەموو ڕێبازان ڕاستترە، جا ئا ئەوە ئامانجی قورئانە، قورئان هاتوە کە هەموو کەس ڕێنمایی بکات بۆ

ڕێبازێك، كە باشترین ڕێبازە، لە چ ڕوویەكەوە؟ لەڕووی عەقیدەوە، لەڕووی عیبادەتەوە، لەڕووی فیكرەوە، لەڕووی فەرهەنگ و كلتوورەوە، لەڕووی ئەخلاق و ڕەوشتەوە، لەڕووی هەڵسوكەوتی خێزانییەوە، لەڕووی بازرگانییەوە، لەڕووی مامەڵەو هەڵسوكەوتەكان بەهەموو ڕەهەندەكانیانەوە، هەڵسوكەوتی سیاسی، هەڵسوكەوتی حوكمڕان لەگەڵ كۆمەڵگا، كۆمەڵگا لەگەڵ حوكمڕان، هەڵسوكەوتی دەوڵەتان لەگەڵ دەوڵەتان... هتد، بەڵێ قورئان بۆیە نێردراوە كە ئینسان ڕێنمایی بكات، كە بەشێوەیەك بژیێ شایستەی ئینسان بێ، ئەویش ئەوەیە كە خوای لێ ڕازیبێ، ئەویش شێوە ژیانێكە كە ئینسان بە شێوەیەك دەژی ئینسانێتی ئینسانی تێدایە، ئینسانێتی لەخۆیدا دەپارێزێ و بەندایەتی لەخۆیدا دێنێتەدی بۆ خوا، چونكە بە تەئكید ئینسان لەژێر سایەی شەریعەتی خوا بەولاوە، نە ئینسان دەمێنێ و نەدەشگونجێت بەندەی خوا بێت، بەڵكو دەبێتە بەندەی ئەموئەوو بەدڵنیاییش لەو كاتەدا بەمانای وشەی ئینسان نامێنێ، بۆیە خوای دادگەر لە سوورەتی (الأعراف)دا ئاوا باسی ئەهلی كوفر دەكات: ﴿وَلَقَدْ ذَرَأْنَا لِجَهَنَّمَ كَثِيرًا مِّنَ الْجِنِّ وَالْإِنسِ ۖ لَهُمْ قُلُوبٌ لَّا يَفْقَهُونَ بِهَا وَلَهُمْ أَعْيُنٌ لَّا يُبْصِرُونَ بِهَا وَلَهُمْ آذَانٌ لَّا يَسْمَعُونَ بِهَا ۚ أُولَٰئِكَ كَالْأَنْعَامِ بَلْ هُمْ أَضَلُّ ۚ أُولَٰئِكَ هُمُ الْغَافِلُونَ ﴿١٧٩﴾﴾، واتە: وە بێگومان ئامادەمان كردوە بۆ دۆزەخ كەسانێكی زۆر لە ئادەمیزادو جن، كە عەقڵیان هەیە پێی تێناگەن، دڵیان هەیە پێی نافامن، چاویان هەیە پێی نابینن، گوێیان هەیە پێی نابیستن، ئەوانە وەك ئاژەڵن، بەڵكو لە ئاژەڵیش خراپترن، ئەوانە بێئاگان.

ئنجا ئینسان بەچی ئاگادار دەبێ؟ بەوەی بەدوای ئاگاداركەرەوەكانی خوای كاربەجێ بكەوێ، كە پێغەمبەرانن (علیهم الصلاة والسلام)، وە بەدوای هیدایەت و بەرنامەی خوای ڕێنمایی كەر بكەوێ.

## پێنجەم: چۆنیەتی دابەزینی قورئان:

قورئان چۆن دابەزیوە بۆ سەر دڵی موبارەكی پێغەمبەر ﷺ؟ خوای زاناو شارەزا لە سوورەتی (الشورى)دا دەفەرموێ: ﴿وَمَا كَانَ لِبَشَرٍ أَن يُكَلِّمَهُ اللَّهُ إِلَّا وَحْيًا

أَوْ مِن وَرَآيِ حِجَابٍ أَوْ يُرْسِلَ رَسُولًا فَيُوحِيَ بِإِذْنِهِۦ مَا يَشَآءُ ۚ إِنَّهُۥ عَلِيٌّ حَكِيمٌ ﴿٥١﴾ ﴾،
واتە: هیچ بەشەرێك (هیچ كەسێك) بۆی نیە خوا بیدوێنێ، مەگەر بە سروش بیخاتە دڵی، یان لە پشت پەردەوە قسەی لەگەڵدا بكات، یان ڕەوانەكراوێك بنێرێ (كە مەبەست پێی فریشتەیەو بەرجەستە ببێ لە شێوەی ئینساندا)و ئەوەی، كە خوا دەیەوێ پێی ڕابگەیەنێ، بێگومان ئەو بەرزی كاربەجێیە.

شەرحی ئەم ئایەتە فەرمایشتێكی پێغەمبەر ﷺ دەیكات: حارسی كوڕی هیشام لێی پرسی ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ چۆن وەحییت بۆ دێ؟ ئەویش لە وەڵامدا فەرمووی: {(أَحْيَاناً يأْتِينِي مِثْلَ صَلْصَلَةِ الجَرَسِ، وَهُوَ أَشَدُّهُ عَلَيَّ، فَيُفْصَمُ عَنِّي وَقَدْ وَعَيْتُ عَنْهُ مَا قَالَ، وَأَحيَاناً يَتَمَثَّلُ لِيَ المَلَكُ رَجُلاً، فَيُكَلِّمُنِي فَأَعِيَ مَا يَقُولُ) (رَوَاهُ البُخَارِي برقم: (٢) عَنِ الحَارِث بْنِ هِشَام}، واتە: هەندێك جار وەك دەنگی زەنگوڵەو جەرەس بۆم دێ، كە ئەوە لە هەموو حاڵەتەكان قورسترە (واتە: دەنگەكە وەك دەنگی زەنگوڵو جەرەس دێ، بەڵام من تێیدەگەم) دوای ئەوەی كۆتایی دێت وەریدەگرم تێی گەیشتووم، وە جاری واش هەیە فریشتە دەچێتە سەرشێوەی ئینسانێك و قسەم لەگەڵدا دەكات و، ئەوەی كە دەیڵێ لێی تێدەگەم.

وە ئەوەیان، كە خوا ﷻ لەوبارەوە دەفەرموێ: ﴿ أَوْ مِن وَرَآيِ حِجَابٍ ﴾ ئەوەیە، كە خوا فەرمایشتی لەگەڵ مووسادا ﷺ فەرمووە، لە دەشتی (سینا)دا، وە كە لە شەوی (میعراج)دا فەرمایشتی لەگەڵ موحەممەد ﷺ فەرمووە، واتە: خوای بێ هاوەڵ پێغەمبەری كۆتایی خۆی دواندوە، وەك چۆن مووسای دواندوە، ئەوە شێوەی دابەزینی وەحییە، كە دیارە چەمكی ئەم وەحییە فراوانترە لە قورئان، واتە: وەحی هەم ئایەتەكانی قورئان دەگرێتەوەو هەم ئەو شتانەی دیكەش كە قورئان نین، شایانی باسیشە كە پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر بە وەرگرتنی وەحییەوە ماندووبووە، وەك دایكی بڕواداران عائیشە خوا لێی ڕازی بێ فەرموویەتی: {(وَلَقَدْ رَأَيْتُهُ يَنْزِلُ عَلَيْهِ الوَحِيُ فِي اليَوْمِ الشَّدِيدِ البَرْدِ، فَيُفْصِمُ عَنْهُ وَإِنَّ جَبِينَهُ لَيَتَفَصَّدُ عَرَقاً) (رَوَاهُ البُخَارِي برقم: (٢)، عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا}، واتە: پێغەمبەری خوام

ﷺ دەبینی لە ڕۆژی ساردی زستاندا وەحی دادەبەزیە سەر، دوای ئەوەی کە وەحی کۆتایی دەهات، زەنگوڵ زەنگوڵ نێوچاوانی ئارەقی دەردەدا، (واتە: تووشی نارەحەتیی‌و ماندوویێتی دەبوو).

هەروەها (زید بن ثابت) خوا لێی ڕازی بێ لەوبارەوە گوتوویەتی: {(أُنْزِلَ عَلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ وفَخِذُهُ عَلَى فَخِذِي، فَكَادَتْ فَخِذُهُ تَرُضُّ فَخِذِي) (رَوَاهُ الْبُخَارِيُّ برقم: (٢٨٣٢)}، واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ لە کاتێکدا کە ڕانی لەسەر ڕانم بوو وەحی بۆ هات، خەریك بوو ڕانی ڕانم بهاڕێ.

هەروەها (عُبادَة بن الصَّامِت) خوا لێی ڕازی بێ لەمبارەیەوە دەڵێ: {(كَانَ نَبِيُّ اللَّهِ ﷺ إِذَا أُنْزِلَ عَلَيْهِ الْوَحْيُ كُرِبَ لِذَلِكَ وَتَرَبَّدَ وَجْهُهُ وَغَمَّضَ عَيْنَيْهِ) (رَوَاهُ مُسْلِمٌ برقم: (٦٠١٤)}، واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێك وەحی دادەبەزیە سەر، بەهۆی ئەوەوە نارەحەت دەبوو، وە ڕووی دەگۆڕاو تاریك دەبوو، وە چاوەکانی دەنووقاند.

دیارە پێغەمبەر ﷺ کاتێك چۆتە ئەو ئاستەوە، کە لەگەڵ خوای بەرزو بێهاوتادا قسە بکاتو، ئەو وەحییە لە فریشتە وەربگرێ، پێویستی بە حاڵەتێکی ڕووحی بەهێز هەبووە، کە تەنیا لە توانای پێغەمبەردا ﷺ بووە، ئەویش بەزەحمەت بۆی تەحەممولکراوە.

**شەشەم: ئایا ژمارەی سوورەتەکانی قورئانو ژمارەی ئایەتەکان چەندن، وە جۆرەکانیان چۆنن ؟**

وەڵامی ئەم پرسیارە لە چەند بڕگەیەکدا دەخەینەڕوو:

أ- سەرەتا بە پێویستی دەزانم ئاماژەیەکی کورت بە مانای هەرکام لە (سُورة) و (آية) بکەین:

وشەی (سُورة) لە زمانی عەرەبییدا وەك (راغب الأصفهاني) دەڵێ: (السُّورَةُ: الـمَنْزِلَةُ الرفِيعَةُ.. وَسُورُ الـمدينةِ: حَائِطُها الـمُشْتَمِلُ عَلَيْها. وسُورَةُ القُرآنِ

تَشبيهاً بِهَا لِكَونـهِ مُحـاطاً بِها إِحاطَـةَ الـسُّورِ بالـمدينة)[1]، بـه مانـای پلـەو پایەی بەرز، یـان شـوورەی شار، دێ، کـه دیـاره سـوورەتەکانی قورئـان هـەم پلـەو پایـەیان بـەرزو باڵایـەو، وه هـەم وەك چـۆن شـوورەی شـاردەوری شـاری داوه، ئەوانیش دەوری ئایەتەکان دەدەن.

جا دیاره هەر سوورەتێك لە کۆمەڵێك ئایەت پێکدێ، جا هەیانە وەك (البقـرة) له (٢٨٦) ئایەت پێکدێ، کە درێژترین سوورەتەو، هەشیانە وەك (الکوثر) لـه (٣) ئایەت پێکدێ، کە کورتتـرین سوورەتە.

وشەی (آية)یش بە مانای نیشانه (عَلاَمَـة) دێ، جا خوای کاربـەجێو زانـا هـەر کـام لـه ڕسـتەو بڕگـەکانی قورئـانو دیـاردەو، دیمەنـه سروشـتییەکانی بـه (آيـة) نـاوبردوون، وەك فەرمووویـەتی:﴿ ...وَإِذَا تُلِيَتْ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُهُۥ زَادَتْهُمْ إِيمَٰنًا وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ ﴿٢﴾ ﴾ الأنفـال، کـه لێـرەدا مەبەسـت لـه ئایەتـه خوێنراوەکـان، ڕسـتەو بڕگـەکانی قورئانـه، وه فەرمووویـەتی: ﴿ وَكَأَيِّن مِّنْ ءَايَةٍ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ يَمُرُّونَ عَلَيْهَا وَهُمْ عَنْهَا مُعْرِضُونَ ﴿١٠٥﴾ ﴾ یوسـف، کـه دیـاره مەبەسـت لێرەدا لـه ئایەتـەکانی نێو ئاسمانـەکانو زەوی دیـاردەو دیمەنـه سروشـتییەکانن، چونکه هەر کام له ڕستەکانی قورئانو دیـاردەو دیمەنـه سروشـتییەکان، نیـشانەو بەڵگەی پەروەردگارێتیو بەرزییو مەزنی خوان ﷻ.

ب – بە یەکدەنگیی هەموو زانایان، ژمارەی سوورەتەکانی قورئان (١١٤)ه‌یه، ڕایـەکی ڕیزپـەڕ (شـاذ) هەیـه، کـه دەڵـێ: (١١٣)ه یـه، ئـەویش سـوورەتی (ئـەنفال) و (تۆبە)ی بەیەك سوورەت داناوه، وه بەڵگەشیان ئەوەیه کـه (بـسم الله الـرحمن الـرحيم) نەخراوەتـه نێوانیانـەوه، بـەڵام زۆربـەی زانایـان ئـەم ڕایـه بـه هەڵـه دەزانن‌و دەڵێن: حیکمـەتی نـەبوونی (بـسم الله الـرحمن الـرحيم) لـه سـەرەتای سوورەتی (تۆبە)دا کە سوورەتی (بەرائە)شی پێدەڵێن، ئەوەیه کە ئەم سـوورەته

[1] مفردات ألـفاظ القرآن، ص: (٤٣٤).

زیاتر هەڕەشەو تووڕەیی خوای تۆڵەستێنە بۆ ئەهلی کوفرو نیفاق، بۆیە گونجاو نەبووە (بسم الله الرحمن الرحیم) لە پێشی دابنرێ، ئەگەرنا سوورەتێکی سەربەخۆیە.

ئنجا لەو (١١٤) سوورەتەی قورئان هەشتاو شەش (٨٦)یان لە (مەککە) هاتوونە خوارێو بیستوهەشت (٢٨)یان لە (مەدینە)، بۆیە کە لە سەرەتای سوورەتەکان دەنووسرێ (مکیة ، مدنیة) مەبەست پێی ئەوەیە کە بەشێك لە سوورەتەکان، کە وەك گوتمان ژمارەیان (٨٦)ە، لە قۆناغی مەککە هاتوونە خوار، واتە ئەو کاتەی پێغەمبەر ﷺ جاری لە حاڵەتی بانگەوازو کارو چالاکیو ڕێکخراوەیی دابووەو، نەچۆتە نێو حاڵو قۆناغی دەوڵەتو قەوارەی سیاسیەوەو، لە (مەککە)و دەوروبەریدا ژیاوەو ئەو سوورەتانە لەوێ دابەزیون، بۆیە پێیان دەگوترێ: سوورەتە مەککیەکان، سوورەتە مەدەنییەکانیش کە گوتمان ژمارەیان (٢٨)ە، ئەوانەن کە دوای ئەوەی پێغەمبەر ﷺ کۆچی کردوە بۆ (مەدینە) لەوێ هاتوونە خوار، بە کورتی: نزیکەی: دوو لەسەر سێی (٢/٣)ی قورئان لە مەککە هاتۆتە خوارێو یەك لەسەر سێی (١/٣)و تۆزێك زیاتری، قورئان لە مەدینە هاتۆتە خوارێ.

ج- بەنسبەت ژمارەی ئایەتەکانی قورئانیش: جارێ هەموو زانایان لەسەر ئەوە یەکدەنگن، کە ئایەتەکانی قورئان لە (٦٠٠٠) کەمتر نین، ئنجا هەندێکیان دەڵێن: (٦٢٠٤)، وە هەندێکیان دەڵێن: (٦٢١٤)، هەروەها هەرکام لە ژمارەکانی: (٦٢١٩)و (٦٢٢٥)و (٦٢٢٦)و (٦٢٣٦) کەمو زۆر لایەنگرییان هەن[1].

هەروەها ژمارەی وشەکانی: (٧٧٤٣٩) حەفتاو حەوت هەزارو چوار سەدو سیو نۆ، وە ژمارەی پیتەکانی: (٣٤٠٧٤٠) سێسەدو چل هەزارو حەوسەدو چلە.

پێویستە ئەوەش بزانرێ، کە هۆکاری ڕاجیایی زاناو شارەزایان لەبارەی ژمارەی ئایەتەکانی قورئانەوە، ئەوەیە کە لەبارەی درێژییو کورتیی ڕستەو بڕگەکانی

---

١) بڕوانە: المصباح المنیر في تهذیب تفسیر ابن کثیر، ص: (١٤).

قورئانەوە ڕا جیایی‌یان هەیە، بۆ نموونە: لە سووڕەتی (الماعون)دا، كە خوا دەفەرموێ: ﴿ فَوَيْلٌ لِّلْمُصَلِّينَ ﴿٤﴾ الَّذِينَ هُمْ عَن صَلَاتِهِمْ سَاهُونَ ﴿٥﴾ ﴾، هەرچەندە تێكڕای زانایان ڕاوەستان (وقف) لەسەر ﴿ فَوَيْلٌ لِّلْمُصَلِّينَ ﴾ یان بە حەرام داناوە، چونكە ماناكەی هەڵەیە، وە هەموویان دەڵێن: دەبێ یەكسەر ڕستەكەی دواییشی لەگەڵ بخوێنرێ: ﴿ الَّذِينَ هُمْ عَن صَلَاتِهِمْ سَاهُونَ ﴾، تاكو ماناكەی ڕاست بێ: جا سزای سەخت بۆ ئەو نوێژكەرانەی، كە لە نوێژەكانیان بێئاگان.

بەڵام لە ڕووی ژمارەی ئایەتەكانەوە، بەشێكیان هەردووك ڕستەكەیان بە یەك ئایەت داناوەو، بەشێكیشیان بە دوو ئایەتیان داناون، ئیدی لێرەوە سەرژمێریی ئایەتەكان جیاوازیی تێكەوتوە، ئەگەرنا هیچ كەس نەیگوتوە ڕستەیەك و بڕگەیەك، بگرە وشەیەك و پیتێك، لە قورئان كەم‌وزیادی هەیە، بەڵكو مەسەلەكە لە درێژیی و كورتیی ئەو ڕستەو بڕگانەوە سەریهەڵداوە كە بە ئایەت دانراون.

<u>حەوتەم: كۆكردنەوەی قورئان، ئایا قورئان چۆن كۆكراوەتەوە؟</u>

بە سەرنجدانی مێژووی كۆكردنەوەی قورئان بۆمان دەردەكەوێ كە بە سێ قۆناغاندا پێیەڕیوە:

<u>قۆناغی یەكەم</u>: نووسینەوەی دەستبەجێی قورئان پاش وەرگیرانی و لەبەركرانی لەلایەن پێغەمبەری خواوە ﷺ، وە لەلایەن هاوەڵانەوە خوا لێیان ڕازی بێ، وەك خوای بەرزو مەزن لەوبارەوە بە پێغەمبەری خۆی فەرمووە: ﴿ سَنُقْرِئُكَ فَلَا تَنسَىٰ ﴿٦﴾ إِلَّا مَا شَاءَ اللَّهُ ۚ إِنَّهُ يَعْلَمُ الْجَهْرَ وَمَا يَخْفَىٰ ﴿٧﴾ ﴾ الأعلى، واتە: دڵنیابە بەسەرتدا دەخوێنینەوەو لەبیرناچێتەوە، مەگەر ئەوەی خوا بیەوێ، بێگومان ئەو ئاشكراو پەنهان دەزانێ.

هەروەها فەرموویەتی: ﴿ لَا تُحَرِّكْ بِهِ لِسَانَكَ لِتَعْجَلَ بِهِ ﴿١٦﴾ إِنَّ عَلَيْنَا جَمْعَهُ

وَقُرْءَانَهُۥ ﴿١٧﴾ فَإِذَا قَرَأْنَٰهُ فَٱتَّبِعْ قُرْءَانَهُۥ ﴿١٨﴾ ثُمَّ إِنَّ عَلَيْنَا بَيَانَهُۥ ﴿١٩﴾ ﴾ القيامة، واتە: زمانتی پێ مەجووڵێنە تاکو پەلەی لێ بکەی، بێگومان لەسەر ئێمەیە کۆکردنەوەو خوێندنەوەی، جا هەرکات خوێندمانەوە دوای خوێندنەوەکەی بکەوە، پاشان بێگومان ڕوونکردنەوەیشی لەسەر ئێمەیە.

قۆناغی دووەم: کۆکردنەوەی‌و نووسینەوەی لە ڕۆژگاری خەلیفایەتی ئەبووبەکری صیددیق دا خوا لێی ڕازی بێ، لەلایەن (زید بن ثابت)ەوە خوا لێی ڕازی بێ، کە یەکێك بوو لە نووسەرەوە (کاتب)ەکانی وەحی لە ڕۆژگاری پێغەمبەری خوادا ﷺ، وەك لەم دەقەدا دەردەکەوێ، کە (بخاري و أحمد) هێناویانە: {(عَنْ زَيدَ بنَ ثَابتٍ رضي الله عنه: أَرْسَلَ إليَّ أبُو بَكرٍ، مَقْتَلَ أَهْلِ اليَمَامَةِ، فَإِذَا عُمَرُ بْنُ الخَطَّابِ عِنْدَهُ، قَالَ أبُو بَكرٍ رضي الله عنه: إنَّ عُمَرَ أَتَانِي فَقَالَ: إِنَّ القَتْلَ قَدِ استَحَرَّ يَومَ اليَمَامَةِ بِقُرَّاءِ القُرآنِ، وَإِنِّي أَخْشَى أنْ يَسْتَحِرَّ القَتْلُ بِالقُرَّاءِ بِالمَوَاطِنِ، فَيَذْهَبَ كَثِيرٌ مِنَ القُرآنِ، وَإِنِّي أرَى أَنْ تَأمُرَ بِجَمْعِ القُرآنِ. قُلْتُ لِعُمَرَ: كَيْفَ تَفْعَلُ شَيْئاً لَمْ يَفْعَلْهُ رَسُولُ اللهِ ﷺ؟! قَالَ عُمَرُ: هَذَا وَاللهِ خَيْرٌ، فَلَمْ يَزَلْ عُمَرُ يُرَاجِعُنِي حَتَّى شَرَحَ اللهُ صَدْرِي لِذلكَ، وَرَأَيتُ فِي ذَلِكَ الَّذِي رَأَى عُمَرُ. قَالَ زَيدٌ: قَالَ أَبُو بَكرٍ: إنَّكَ رَجُلٌ شَابٌ عَاقِلٌ لاَ نَتَّهِمُكَ وَقَدْ كُنْتَ تَكْتُبُ الوَحْيَ لِرَسُولِ اللهِ ﷺ فَتَتَبَّعِ القُرآنَ فَاجْمَعْهُ، فَوَاللهِ لَوْ كَلَّفُونِي نَقْلَ جَبَلٍ مِنَ الجِبَالِ مَا كَانَ أَثْقَلَ عَلَيَّ مِمَّا أَمَرَنِي بِهِ مِنْ جَمْعِ القُرآنِ. قُلْتُ: كَيْفَ تَفْعَلُونَ شَيْئاً لَمْ يَفْعَلْهُ رَسُولُ اللهِ ﷺ؟! قَالَ: هُوَ وَاللهِ خَيْرٌ، فَلَمْ يَزَلْ أَبُو بَكرٍ يُرَاجِعُنِي حَتَّى شَرَحَ اللهُ صَدْرِي لِلَّذِي شَرَحَ لَهُ صَدْرَ أَبِي بكرٍ وَ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُما فَتَتَبَّعْتُ القُرآنَ أَجْمَعُهُ مِنَ العُسُبِ وَاللِّخَافِ وَصُدُورِ الرِّجَالِ، حَتَّى وَجَدْتُ آخِرَ سُورَةِ التَّوبَةِ مَعَ أَبِي خُزَيْمَةَ الأَنْصَارِيِّ لَمْ أَجِدْهَا مَعَ أَحَدٍ غَيرَهُ ﴿ لَقَدْ جَآءَكُمْ رَسُولٌ مِّنْ أَنفُسِكُمْ عَزِيزٌ عَلَيْهِ مَا عَنِتُّمْ حَرِيصٌ عَلَيْكُم بِٱلْمُؤْمِنِينَ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴿١٢٨﴾ ﴾ التوبة، حَتَّى خَاتِمَةِ بَرَاءَةَ، فَكَانَتِ الصُّحُفُ عِنْدَ أَبِي بَكرٍ حَتَّى تَوَفَّاهُ اللهُ ثُمَّ عِنْدَ عُمَرَ حَيَاتَهُ، ثُمَّ عِنْدَ

حَفْصَةَ بِنْتِ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ)، رَوَاهُ أَحْمَد بِرقم: (٢١٥٣٧)، وَالبُخَارِي بِرقم: (٤٩٨٦)}، واتە: زەیدی کوڕی سابیت دەڵێ: ئەبوبەکری صیددیق (خوا لێی ڕازی بێ) لەدوای ناردم دوای کوشتاری جەنگی یەمامە (کە ژمارەیەکی زۆر لەوانەی قورئانیان لەبەربوو لە هاوەڵانی بەڕێز کوژران، چونکە ئەوانەی قورئانیان لەبەربوو سەرەڕەی سوپای ئیسلام بوونو لە سەنگەرەکانی پێشەوە دەبوون) کە چووم بۆ لای، عومەری کوڕی خەتتابی لەلابوو، ئەبووبەکر گوتی: عومەر هاتوە بۆ لامو پێم دەڵێ لە ڕۆژی یەمامەدا ژمارەیەکی زۆر لە قورئان لەبەرەکان کوژراون، وە من دەترسم لە شوێنەکانی دیکەش قورئان لەبەرەکان بکوژرێن، (چونکە ئەوان هەردەچنە پێشەوە) وە سەرەنجام زۆرێك لە قورئان بفەوتێ، بۆیە من پێم وایە فەرمان بکەی قورئان کۆبکرێتەوە (واتە: لە دوو توێی بەرگێکدا) ئەبوبەکر دەڵێ: بە عومەرم گوت، چۆن شتێك بکەین کە پێغەمبەری خوا ﷺ نەیکردوە؟ دەڵێ: عومەر گوتی: وەڵڵاهی ئەوە شتێکی باشەو خێرە (هەرچەندە پێغەمبەر ﷺ نەیکردوەو دیارە، کە پێغەمبەریش بۆیە نەیکردوە، چونکە بەردەوام ئایەتەکان بە گوێرەی ڕووداوو بۆنەکان دابەزیونو دەبووایە بەردەوام بیگۆڕنو، ئەمەش لەو کاتەدا شتێکی زۆر قورس بووە) ئیدی عومەر بەردەوام لەگەڵمدا موناقەشەی کرد، هەتا منیش قەناعەتم هاتو سینەم بۆ ئەم کارە گوشادبوو، وە هاتمە سەر ڕای عومەر، زەید دەڵێ: ئەبووبەکر پێی گوتم ئەتۆ پیاوێکی گەنجیو عاقڵیو تۆمەتبارنی لای ئێمەو جێی متمانەی، وە لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ تۆ وەحییت دەنووسیەوە، بۆیە بەدوای قورئان بکەوە، کۆبکەوە (واتە: ئەوەی کە نووسراوەتەوە لەسەر بەردی تەنكو پێستو ئەوانە...) بە خوا ئەگەر پێیان گوتبام چیایەك لە چیاکان بگوازەوە بۆ شوێنێك هێندەم لەسەر شان قورس نەبوو، پێم گوتن: ئاخر چۆن شتێك دەکەن کە پێغەمبەری خوا ﷺ نەیکردبێ؟! (تەماشا بکەن ئەوانە چەندە پابەند بوونە!)، ئەویش گوتی: وەڵڵاهی ئەوە شتێکی چاکەو خێرە، ئیدی ئەبووبەکر هەر لەگەڵم خەریك بوو هەتا خوا سینەی گوشاد کردم بۆ ئەو ڕایەی کە سینەی ئەبووبەکرو عومەری بۆ گوشاد کردبوو، خوا لێیان ڕازی

بێ، ئیدی شوێن قورئان کەوتم بۆ کۆکردنەوەی ئەوەی کە لەسەر لاسکە پانەکانی دارخورمادا نووسرابوو، وە ئەوەی کە لەسەر بەردی تەنك نووسرابوو، وە ئەوەی کە لە سینەی پیاواندا هەبووە (دیارە کە هەمووی بەراورد کردوون، نەك هەمووی نووسینەوە،) هەتا کۆتایی سوورەتی تەوبەم لەلای (أبي خزيمة الأنصاري) دۆزییەوە جگە لەو لای کەسی دیکە نەبوو: ﴿ لَقَدْ جَآءَكُمْ رَسُولٌ مِّنْ أَنفُسِكُمْ عَزِيزٌ عَلَيْهِ مَا عَنِتُّمْ حَرِيصٌ عَلَيْكُم بِٱلْمُؤْمِنِينَ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴿١٢٨﴾ ﴾ التوبة، جا ئەو پەڕانە لای ئەبووبەکر بوون تاکو خوا بردیەوە، ئنجا لەدوای خۆی لەلای عومەر بوون، هەتا لە ژیاندا بوو، پاشان لەلای حەفصەی کچی عومەر بوون، خوا لێیان ڕازی بێ.

<u>قۆناغی سێیەم</u>: قۆناغی سێیەمی کۆکردنەوەو نووسینەوەی قورئان لە ڕۆژگاری خەلیفایەتی (عثمان بن عفان)دا بوو خوا لێی ڕازی بێ، وەك لەم دەقەدا دەبینرێ، کە (بخاري) هێناویەتی: {(حَدَّثَنَا مُوسَى: حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ: حَدَّثَنَا ابْنُ شِهَابٍ: أَنَّ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ حَدَّثَهُ: أَنَّ حُذَيْفَةَ بْنَ الْيَمَانِ قَدِمَ عَلَى عُثْمَانَ، وَكَانَ يُغَازِي أَهْلَ الشَّأْمِ فِي فَتْحِ إِرْمِينِيَةَ وَأَذْرَبِيجَانَ مَعَ أَهْلَ الْعِرَاقِ، فَأَفْزَعَ حُذَيْفَةَ اخْتِلَافُهُم فِي الْقِرَاءَةِ، فَقَالَ حُذَيْفَةُ لِعُثْمَانَ: يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ، أَدْرِكْ هَذِهِ الْأُمَّةَ قَبْلَ أَنْ يَخْتَلِفُوا فِي الْكِتَابِ، اخْتِلَافَ الْيَهُودِ وَالنَّصَارَى. فَأَرْسَلَ عُثْمَانُ إِلَى حَفْصَةَ: أَنْ أَرْسِلِي إِلَيْنَا بِالصُّحُفِ نَنْسَخُهَا فِي الْمَصَاحِفِ ثُمَّ نَرُدُّهَا إِلَيكَ، فَأَرْسَلَتْ بِهَا حَفْصَةُ إِلَى عُثْمَانَ، فَأَمَرَ زَيدَ بْنَ ثَابِتٍ، وَ عَبْدَاللهِ بْنَ الزُّبَيْرِ، وَسَعِيدَ ابْنَ الْعَاصِ، وَ عَبْدَالرَّحْمنِ بْنَ الْحَارِثِ بْنِ هِشَامٍ، فَنَسَخُوهَا فِي الْمَصَاحِفِ، وَقَالَ عُثْمَانُ لِلرَّهْطِ الْقُرَشِيِّينَ الثَّلَاثَةِ: إِذَا اخْتَلَفْتُمْ أَنْتُمْ وَ زَيْدُ بْنُ ثَابِتٍ فِي شَيءٍ مِنَ الْقُرْآنِ فَاكْتُبُوهُ بِلِسَانِ قُرَيْش، فَإِنَّمَا نَزَلَ بِلِسَانِهِم، فَفَعَلُوا، حَتَّى نَسَخُوا الصُّحُفَ فِي الْمَصَاحِفِ رَدَّ عُثْمَانُ الصُّحُفَ إِلَى حَفْصَةَ، وَأَرْسَلَ إِلَى كُلِّ أُفُقٍ بِمُصْحَفٍ مِمَّا نَسَخُوا، وَأَمَرَ بِمَا سِوَاهُ مِنَ الْقُرْآنِ فِي كُلِّ صَحِيفَةٍ أَو مُصْحَفٍ أَنْ يُحْرَقَ) (رَوَاهُ الْبُخَارِيُّ بِرقم:

(٤٩٨٧)}، واتە: مووسا بۆی گێڕاینەوە ئەویش لە ئیبراهیم و ئیبراهیمیش لە ئیبنو شیهاب، كە ئەنەسی كوڕی مالیك بۆی گێڕاوەتەوە، كە حوزەیفەی كوڕی یەمان چووە بۆ لای عوسمان (خوا لێیان ڕازی بێ، كە ئەو كاتە عوسمان خەلیفەی سێیەمی مسوڵمانان بوو) لەبەر ئەوەی حوزەیفەی كوڕی یەمان دەچوو بۆ جەنگ (غەزا)، لەگەڵ ئەهلی شامدا دەچوو بۆ ئەرمینیا، وە لەگەڵ ئەهلی عێراقدا دەچوو بۆ ئەزەربایجان، (واتە: لە هەردوو -جَبْهَة- ی جەنگدا بەشداریی دەكرد) جا كە حوزەیفە دەبینێ (خەڵكی لە مسوڵمانان لە هاوەڵان‌و ئەوانی دیكەش) جیاوازییان هەیە لە قورئان خوێندن داو ڕای جیا جیایان هەیە، دەترسێ‌و بە عوسمان دەڵێ: ئەی گەورەی ئیمانداران! فریای ئەم ئۆممەتە بكەوە پێش ئەوەی مشتومڕو ڕا جیاییان بكەوێتە نێوان، وەك چۆن كەوتە نێوان جوولەكەو نەصرانیی یەكان (دیارە بۆی باس كردوە كە یەكێ بە جۆرێك دەیخوێنێ‌و یەكێكی دی دەڵێ: هی من چاكترەو ئەوەی دی دەڵێ: هی من چاكترە، هەمووشی قیرائات بووە، بەڵام ئاوا كەوتوونەتە مشتومڕەوە) ئیدی عوسمان ناردی بۆ لای حەفصەی كچی عومەر كە ئەو پەڕانەمان بۆ بنێرە، بۆئەوەی چەند موصحەفێكی لەبەر بگرینەوە، دوایی بۆت دەنێرینەوە، حەفصەش بۆی ناردو عوسمانیش فەرمانی كرد بە: (زەیدی كوڕی سابیت وە عەبدوڵڵای كوڕی زوبێر، وە سەعیدی كوڕی عاص، وە عەبدوررەحمانی كوڕی حاریسی كوڕی هیشام)، (واتە: لیژنەیەكی چوار قۆڵیی بۆ پێكهێناوە، كە تەنیا زەیدی كوڕی سابیتیان مەدینەیی‌و ئەنصارییەو، سێیەكەی دی مەككەیین‌و قوڕەیشیین، وە فەرمانی پێ كردن كە بینووسنەوە، واتە: ئەوەی كە پێشتر نووسراوەتەوە، دووبارە بینووسنەوەو بیخەنە نێوان دوو بەرگ) وە بە سێ قوڕەیشییەكانی گوت: ئەگەر لەگەڵ زەیدی كوڕی سابیت لەسەر شتێكی قورئان (پیتێك یان وشەیەك) كەوتنە مشتومڕەوە، بە زاری قوڕەیش بینووسن، (واتە: لەهجەی قوڕەیش)، چونكە قورئان بە لەهجەی قوڕەیش هاتۆتە خوار، ئەوانیش كارەكەیان جێبەجێ كرد، جا دوای ئەوەی لەسەر پەڕەكان چەند موصحەفێكیان نووسیەوە، عوسمان پەڕەكانی ناردنەوە بۆ حەفصە، وە بۆ هەر وڵاتە یەكێك

لەو موصحەفانەی کە نووسیبوویانەوە، نارد. وە فەرمانی کرد هەرچی قورئانی دیکەی نووسراو هەیە، لە شێوەی پەڕ یان موصحەف دا، هەمووی بسووتێنرێ.

شایانی باسیشە یەکێك لەو شتانەی کە دوایی عوسمانیان پێ شەهید کرد بە ناهەقو بە زوڵم، ئەوە بوو کە ڕەخنەیان لێ دەگرت دەیانگوت: تۆ قورئانت سووتاندوون! لەحاڵێکیشدا، کە ئەوە بەڕای من چاکترین و گەورەترین ئیشی بوو کە کردی، هەڵبەتە ئەو قورئانە نووسراوانەش کە عوسمان خوا لێی ڕازی بێ سووتاندوونی، ئەوانە بوون کە هەر کام لەو هاوەڵانە بە بۆچوونی خۆیان نووسیویاننەوە، کە دیارە هەرکامێکیان بە شێوەو ڕیزبەندییەکی تایبەت بووەو، هەیانبووە جگە لە سوورەتەکانی قورئان هەندێك فەرمووده یان ڕوونکردنەوەشیان تێدا نووسیون، وە هەیانبووە سوورەتەکانی بەپێی ڕیزبەندیی (ترتیب)ی هاتنە خوار (نزول)یان بووەو ... هتد، کەواتە: ئەو قورئانەی ئێستا لەبەر دەستمانە هەمان ئەو قورئانو موصحەفەیە کە لە ڕۆژگاری (عوسمان)داو لەلایەن ئەو لیژنە پسپۆڕەوە ئامادە کراوە، دیارە ئەویش هەمان موصحەفی ئامادەکراوی ڕۆژگاری ئەبووبەکری صیددیقە خوا لێی ڕازی بێ، وە ئەویش هەمان قورئانو موصحەفی نووسراوو ئامادەکراوی سەردەمی پێغەمبەری خوایە ﷺ، وە مەبەست لە کۆکردنەوە لە ڕۆژگاری ئەبووبەکرو عوسمان دا خوا لێیان ڕازی بێ، بەس ڕێکوپێك کردنیەتی لە دوو تویی موصحەفو لەنێو بەرگێکداو هیچی دیکە.

## هەشتەم: ڕیزبەندیی (ترتیب)ی ئایەتەکانو سوورەتەکان چۆن بووە؟

زانایان هەموو لەسەر ئەوە یەکدەنگن کە ڕیزبەندیی ئایەتەکانی هەر سوورەتێك، شتێکی (توقیفی)یەو لە ڕێی وەحییەوە بووەو، لەوبارەشەوە بەڵگە زۆرن، بۆ نموونە: {(عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ عَنْ عُثْمَانَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَنزِلُ عَلَيهِ الآيات فَيَقُولُ: ضَعُوهَا فِي السُّورَةِ التي يُذكَرُ فِيهَا كَذَا) (رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ بِرقم: (٧٨٦)، والتِّرمِذِيُّ بِرقم: (٣٠٨٦)، وَصَحَّحَهُ الحاكم}، واتە: پێغەمبەر ﷺ کە ئایەتی دادەبەزینە سەر دەیفەرموو: لەو سوورەتەیان دا دابنێن کە فلانە شتی تێدا باسکراوە.

بەڵام بە نسبەت ڕیزبەندیی سوورەتەكانەوە، ئەوە زانایان ڕا جیایی یان لەوبارەوە هەیە:

بەشێكیان ڕایان وایە، دانانی سوورەتەكانیش بەو شێوەیەو بەو ڕیزبەندیی یەی ئێستا، دیسان شتێكی (توقيفي)یەو بە وەحی بووە.

بەشێكیشیان ڕایان وایە: كە ڕیزبەندیی سوورەتەكان شتێكی (توفيقي)یەو هاوەڵانی بەڕێز بە كۆشش (اجتهاد)ی خۆیان ئاوایان داناوە.

واش پێدەچێ ئەم ڕایەی دووەم ڕاستتر بێ، بەلای كەمەوە بەنسبەت بەشێك لە سوورەتەكانی قورئانەوەو، ئەم دەقەش لەوبارەوە بەڵگەیەكی بەهێزە: {(عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ عَنْ رَضِيَ اللهُ عَنْهُما قَالَ: لِعُثمان: ما حملكم على أنْ عَمَدتُّمْ إلى الأنفالِ وهِيَ مِنَ المَثَاني وإلى البَرَاءَة وهِيَ مِنَ المِئِينَ، فَقَرَنْتُمْ بَيْنَهُمَا ولَمْ تَكتُبُوا بَيْنَهُما سَطْرَ (بسم الله الرَّحمن الرَّحيم)، وَوَضَعْتُمُوها في السَّبْعِ الطُّوَالِ؟! فَقَالَ عُثمانُ ﷺ: كَانَ رَسُولُ الله ﷺ كَثيراً ما تنزلُ عَلَيهِ السورة ذَاتُ العَدَدِ فَإذا نَزَلَ عَلَيهِ شيءُ (يَعني منها) دَعَا بَعض مَنْ كَانَ يَكْتُبُ فَيَقُولُ: {(ضَعُوا هَؤلاءِ الآيَاتِ فِي السُّورَة الَّتي يُذكَرُ فيهَا كَذَا). (وَكَانت الأنفالُ من أوائل ما نَزَلَ بالمدينة، وبَرَاءةُ مِن آخرِ القُرآن، وَكَانَتْ قِصَّتُهَا شَبِيهةً بِهَا فَظَنَنْتُ أنَّها مِنْهَا، فَقُبِضَ رَسُولَ الله ﷺ وَلَمْ يُبَيِّنْ لَنَا أنَّهَا مِنهَا) (رَوَاهُ أَحْمَد برقم: (٣٩٩)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٧٨٦)، وَالتِّرمِذِي برقم: (٣٠٨٦)، وَقَالَ هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحيحٌ، وَالحَاكِمُ وصحَّحهُ وَوَافَقهُ الذهبي)}، واتە: عەبدوڵلای كوڕی عەبباس خوا لێیان ڕازی بێ دەڵێ: بە عوسمانم گوت: چ شتێك وای لێكردن (ئەنفال)، كە لە جۆری (مثاني)[1]یەو (بەرائە) كە لە جۆری (میئین)ە بیانخەنە پاڵ یەكو دێڕی

---

١) سوورەتەكانی قورئان لەڕووی ژمارەی ئایەتەكانو قەبارەیانەوە، زانایان بۆ چوار جۆریان دابەشكردوون:

١- السّبع الطُّوال: كە لە (البقرة) وە هەتا (التوبة)ن.

٢- المئين: كە ئەوانەن لەدوای حەوت سوورەتە درێژترەكانەوە دێنو ژمارەی ئایەتەكانیان دەوری (١٠٠) یان زیاترە.

(بسم الله الرَّحمن الرَّحيم)یشیان لە نێواندا نەنووسنو، لە ریزی حەوت سوورەتە درێژەكاندا دایبنێن؟! عوسمانیش خوا لێی رازی بێ گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ گەلێك جار سوورەتێكی چەند ئایەتیی بۆ دەهاتە خوار، جا هەركات شتێكی (واتە: لەو سوورەتە) بۆ دابەزیبایە یەكێك لەوانەی دەیاننووسیەوە، بانگی دەكردو دەیفەرموو: ئەم ئایەتانە بخەنە ئەو سوورەتەوە كە فلانە شتی تێدا باسكراوە، جا (ئەنفال) لەو سوورەتە سەرەتایانەیە، كە لە مەدینە دابەزیونو، (بەرائە)ش لە سوورەتەكانی كۆتایی قورئانە، بەسەرهاتو بابەتەكەیشی وەك هی وی دەچوو، بۆیە پێموابوو بەشێكە لەوی، ئیدی پێغەمبەری خواش ﷺ گیانی كێشراو بۆی روون نەكردینەوە، كە بەشێكە لەوی {واتە: (ئەنفال) بەشێكە لە (بەرائە)، یان نا}.

بەلاّم هەندێك بەلگەش هەن لەسەر ئەوە، كە بەلای كەمەوە بەشێك لە سوورەتەكانی قورئان، بە فەرمانی وەحی ریزبەند كراون، بۆیە ناگونجێ بە رەهایی بلێین: ریزبەندیی سوورەتەكان ئیجتیهادییو (توقیفي)یە.

**نۆیەم: تەفسیركردنی قورئان یانی چی؟!**

وشەی (تَفْسِير) كە لە ریشەی: (فَسْر)ەوە هاتووەو ئەمیش بە مانای روونیی (وضُوح) دێ، دەگوترێ: (فَسَرَ الشَيءَ، وفَسَّرَ الشَيءَ: وَضَّحَهُ)، واتە: شتەكەی روونكردەوەو دەریخست، لە زاراوەی شەرعزانانو توێژەرەوان داناوە بۆ یەكێك لە پێنج زانیارییە ئیسلامییەكان (العلُوم الإسلامية)، كە تایبەتە بە قورئانەوەو مەبەست لێی شیكردنەوەو روونكردنەوەی ماناو مەبەستەكانی قورئانە، (المعجم الوسيط) لەوبارەوە گوتوویەتی: (تَفْسِير القُرْآن: مِنَ العلُوم الإسلامية يُقْصَدُ مِنْهُ تَوضِيحُ معَاني القُرْآن الكَريم ومَا انطوتْ عَلَيهِ آيَاتُهُ مِن عَقَائدَ وأسرارٍ وحِكَمٍ وأَحكَامٍ)[١]، واتە: تەفسیری قورئان لە زانیارییە ئیسلامییەكانە، مەبەست لێی

---

٣- المثاني: كە لەدوای (مئين)ەوە دێن، هەتا سوورەتی (ق).

٤- المُفصَّل: كە سوورەتە كورتەكانی بەشی كۆتایی قورئانن، لە سوورەتی (ق)وە تا كۆتایی، واتە سوورەتی (الناس).

١) ص: (٦٨٨).

ڕوونکردنـەوەی مەبەسـتو واتایـەکانی قورئـانی بـەڕێزەو، ئەوەیـە کـە ئایەتـەکانی گرتوویانەتە خۆیان، لە بیـروبۆچوونەکانو نهێنییەکانو حیکمەتەکانو یاسـاکان.

خـوای کاربـەجێش لـە زۆر شـوێناندا فـەرمانی کـردوە یـان ئامـاژەی کـردوە بـە هەوڵدان بۆ ڕوونکردنەوەی مەبەستو واتای ئایەتـەکانی قورئـانو لێتێگەیـشتنیان، بۆ نموونە:

١- ﴿ ... وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ وَلَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٤٤﴾ ﴾ النحـل، واتـە: وەبیـرخەرەوەمان بـۆ لای تـۆ ناردۆتـە خـوار، تـاکو ئـەوەی بـۆ لای خەڵکی نێرراوەتە خوار بۆیان ڕوون بکەیەوە، وە بەڵکو خۆشیان بیـربکەنەوە.

٢- ﴿ كِتَٰبٌ أَنزَلْنَٰهُ إِلَيْكَ مُبَٰرَكٌ لِّيَدَّبَّرُوٓا۟ ءَايَٰتِهِۦ وَلِيَتَذَكَّرَ أُو۟لُوا۟ ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿٢٩﴾ ﴾ ص، واتە: ئەمـە کتێبێکـی بـەپێزە بـۆلای تۆمـان ناردۆتـەخوار، تـاکو لـە ئایەتەکانییـەوە ڕامێنن، وە بۆئەوەی خاوەن عەقڵان پەند وەربگرن.

٣- ﴿ وَلَقَدْ يَسَّرْنَا ٱلْقُرْءَانَ لِلذِّكْرِ فَهَلْ مِن مُّدَّكِرٍ ﴿١٧﴾ ﴾ القمـر، واتـە: وە بەڕاسـتی قورئانمـان بـۆ بیـرخـستنەوە ئاسـان کـردوە، جـا ئایـا کـێ هەیـە بـێ پەنـدی لێوەربگرێو لـێی بەهرەمەند بێ !

لەوەشـەوە کـە ڕابـرد بـە سـێنایی دەزانـرێ، کـە تەفـسیرکردنو ڕوونکردنـەوەی قورئـان بـە گـشتی لەسـەر مـسوڵمانان فـەرزە، واتـە: فـەرزی کیفایەیـەو بـە کەمتەرخەمیی تێداکردنی گوناهبار دەبن.

دەیەم: هەرکەسێك بیەوێ بە شێوەیەکی ڕاستو دروست لە قورئان تێبگاتو پاشان تەفسیری بکات، بەلای کەمەوە (وێڕای شارەزایی لـەو زمانـەی کـە قورئـانی پـێ دابەزێنراوە کە عەرەبییـە) پێویستی بە پێنج شتی دیکەش هەیە:

یـەك: گـەڕانەوە بۆ خودی قورئـان:

واتـە: هەرکەسـێك ویـستی لـە مەبەسـتو واتـای ئایـەتێك، یـان چـەند ئایـەتێك تێبگات، پێویستە بەر لە هەرشتێك بگەڕێتەوە بۆ قورئـانو سـەرنجی ئـەو ئایەتانـە

بدات، کە لەبارەی هەمان مەبەستو بابەتەوە دەدوێت، ئەوکاتە بەراوردیان بکاتو بەگشتی سەرنجیان بدات، چونکە وەك گوتراوە: (القُرآن يُفَسِّرُ بَعْضُهُ بَعْضاً)، واتە: قورئان هەندێکی هەندێکی تەفسیر دەکات، بۆ نموونە:

خوای زاناو شارەزا لە سوورەتی (الفاتحة)دا دەفەرموێ: ﴿ صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمۡتَ عَلَيۡهِمۡ ۝٧ ﴾، ئنجا ئەگەر بمانەوێ بزانین ئەو خواپێداوانە کێن، کە خوا خستوونیە سەر ڕاستە شەقامی خۆی؟ با سەرنجی ئایەتی ژمارە (٦٩)ی (النساء) بدەین، کە دەفەرموێ: ﴿ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ فَأُوْلَٰٓئِكَ مَعَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِم مِّنَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ وَٱلصِّدِّيقِينَ وَٱلشُّهَدَآءِ وَٱلصَّٰلِحِينَۚ وَحَسُنَ أُوْلَٰٓئِكَ رَفِيقٗا ۝٦٩ ﴾، کەواتە، خوا پێداوانی ڕێی ڕاست گرتوو بریتین لە: پێغەمبەرانو صیددیقانو شەهیدانو صالحان.

دوو: گەڕانەوە بۆ سوننەتی پێغەمبەر ﷺ:

چونکە بێگومان ئەرکی سەرەکی پێغەمبەری خوا ﷺ بریتی بووە لە ڕوونکردنەوەی قورئان: ﴿ ...وَأَنزَلۡنَآ إِلَيۡكَ ٱلذِّكۡرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيۡهِمۡ ... ۝٤٤ ﴾ النحل، هەڵبەتە لێرەشدا مەبەست ئەوەنیە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ تەفسیرو لێکدانەوەی تایبەتی خۆی هەبێ بۆ قورئان بەگشتی، بەواتا عورفیی‌و زاراوەیی‌یەکەی! چونکە پێغەمبەری خوا نەك هەموو قورئان، بگرە زۆریشی تەفسیر نەکردوە! بەڵکو مەبەستمان لە:

گەڕانەوە بۆ سوننەتی پێغەمبەر بۆ لێتێگەیشتنی قورئان، ئەوەیە کە بگەڕێینەوە بۆ سەرنجدانی سیرەو ژیانو هەڵوێستەکانی پێغەمبەر ﷺ و چۆنیەتی جێبەجێکردن (تطبيق)ی بۆ قورئان، لە هەلومەرجو قۆناغو بارودۆخە جیاجیاکاندا، بۆ نموونە:

ئەگەر بمانەوێ بە شێوەیەکی ڕاستو دروست لە ئایەتەکانی جەنگو جیهاد حاڵی بین، ئایا کام ئایەت لە کوێداو کەیو کام ئایەت لە کوێداو کەی پێویستە

جێبەجێبکرێ؟ ئەوە پێویستە بگەڕێینەوە بۆ سیرەو سوننەتی پێغەمبەری ﷺ، جا ئەوکاتە باش تێدەگەین کە فلان ئایەتەی لە چ قۆناغێکداو، فلان ئایەتەی دیکەی لە چ هەلومەرجو قۆناغێکدا بۆ دابەزیوەو، ئێمەش پێویستە هەمان هەلومەرجو قۆناغ (واتە: شێوەی وی)مان بۆ بێتەوە پێش، تاکو ببینە دوێنراو (مُخاطَبْ)ی خوا بەو ئایەتانەو جێبەجێیان بکەین.

**سێ: بەهرەمەندبوون لە بیروڕاو لێکدانەوەی هاوەڵان و شوێنکەوتووانیان و زانایانی ئۆممەتی ئیسلام بەگشتی:**

ئەمیش هۆکارێکی دیکەی یاریدەدەرە بۆ لێتێگەیشتنی قورئان، چونکە خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ ... فَسْـَٔلُوٓاْ أَهْلَ ٱلذِّكْرِ إِن كُنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴿٤٣﴾ ﴾ النحل، واتە: دەجا ئەگەر نازانن لە خاوەنی زیکر (واتە: شارەزایانی کتێبی خوا) پرسیار بکەن.

بەڵام پێویستە ئەو ڕاستییە بزانرێ، کە جۆری تێگەیشتنی زاناو شارەزایانمان (هەریەکێك بن) لەبارەی قورئانەوە، بۆ ئێمە پابەندکەر (مُلْزِم) نیە، چونکە تێگەیشتنی ئەوانە لەبارەی ئایینەوە، نەك خودی ئایین !

**چوار: خۆڕازاندنەوە بە پارێزکاریی (تَقْوَى):**

بەڵێ بە ئەندازەی پارێزکار (مُتَّقِي) بوونمان، لە قورئان تێدەگەین و لێی بەهرەمەند دەبین، وەك خوای پەنهانبین فەرموویەتی: ﴿ ذَٰلِكَ ٱلْكِتَٰبُ لَا رَيْبَ فِيهِ هُدًى لِّلْمُتَّقِينَ ﴿٢﴾ ﴾ البقرة، وەك دەبینین خوای کاربەجێ ڕێنماییکەر بوونی قورئانی تایبەت کردوە بە پارێزکارانەوە، چونکە هەر ئەوان وەك پێویست بەهرەی لێ وەردەگرن و لێی تێدەگەن.

**پێنج: هەبوونی زانیاریی و شارەزایی بەو واقیعەی تێیدا دەژین چ لەڕووی فیکریی و چ لەڕووی کۆمەڵایەتی و چ لەڕووی سیاسی و... هتدەوە:**

بەڵێ بێگومان بەرچاوڕوونیی و چاوکراوەیی مرۆڤ سەبارەت بەو واقیعە تێیدا دەژی کاریگەرییەکی گەورەی هەیە، لە چاك لێتێگەیشتنی قورئان دا، وە لەڕاستیدا

ئەوانەی بە دوورەپەرێزیی لە خێرو شەڕی كۆمەڵگا ژیان دەبەنە سەرو لە پەراوێزدا دەژینو، كارلێك (تَفَاعُل) لەگەڵ دەوروبەریاندا ناكەن، ناتوانن وەك پێویست لە كتێبی خوا تێبگەنو بەڕاستییەكانی ئاشنابن، لێرەدا قسەیەكی نەستەقی شەهید (سَيِّدْ قُطب)م هاتەوە یاد، كە دەڵێ: (كەسێك لە قورئان تێدەگات كە لە كەشو هەوایەكدا بژی، وەك ئەو كەشو هەواو هەلومەرجەی كە قورئانی تێدا هاتۆتە خوار!).

ئنجا ڕەنگە یەكێك لێرەدا بپرسێ:

ئەدی بەكارهێنانی عەقڵو هۆشی خۆمانو بیركردنەوەی خۆمانت بۆچی باس نەكرد؟!

لە وەڵامدا دەڵێین :

لەڕاستیدا بەكارهێنانی عەقڵو هۆشی خۆمانو بیركردنەوەو ڕامانی خۆمان بۆ تێگەیشتنی كتێبی خوا ﷻ، مەرجێكی سەرەكییو بنەڕەتییو بەردەوامە، چونكە چ بۆ گەڕانەوە بۆ قورئانو بەراوردكرنی ئایەتەكانو، چ بۆ گەڕانەوە بۆ سوننەتی پێغەمبەری خوا ﷺو، چ بۆ بەهرەمەند بوون لە قسەو بیروڕاو كەلەپووری زانایانو، چ بۆ وەدەستهێنانی پارێزكارییو خۆ پێڕاراندنەوەیو، چ بۆ شارەزاییو زانیاری پەیداكردن بە واقیعو تەوژمە فیكرییو سیاسیو كۆمەڵایەتییەكانی، بەبێ ئامادەبوونی چالاكانەی عەقڵو بیركردنەوەو ڕامانی شێلگیرانە، هیچمان بۆ هیچ ناكرێو دارمان بۆ لەسەر بەرد دانانرێ[1]!

هەر لێرەشدا وەڵامی پرسیاری: ئایا تەفسیری عەقڵیی چاكترە یان تەفسیری شوێنەواریی؟ (هَلْ التفسير بالرأي أفضَل أم التفسير بالمأثور؟!) ئاسان دەبێو دەڵێین:

---

١) وا باشە بۆ چاك بەهرە وەرگرتن لە قورئان سەرنجی كتێبی: (چۆن باشتر لە قورئان بەهرەمەند دەبین؟!) بدرێ، كە هەتا ئێستا سێ جار لەلایەن سەنتەری حیكمەوە چاپ كراوە.

لەڕاستیدا هیچ كام لە (أَثَر) و (رَأي)، یان (نَص) و (عَقْل) بەدیلی یەكدی نین، بۆ لێتێگەیشتنی قورئان، بەڵكو هەردووكیان پێویستن هەركامیان لە بواری خۆیدا. ئنجا ئەگەر سەرنجی تەفسیرە گەورەو گرنگەكانی قورئان وەك:

١- (جامع البیان)ی (الطَبَري).

٢- (الجامع لأحكام القُرآن)ی (القُرطُبي).

٣- (مَفَاتِیحُ الغیب)ی (فَخْرَالدین الرازي).

٤- (تَفسیر القُرآن العَظِیم)ی (ابن كَثیر).

٥- (فَتح القدیر)ی (الشَوكاني).

٦- (روح المَعَاني)ی (الآلوسي).

٧- (في ظِلال القُرآن)ی (سَیِّد قُطْب).

بدەین دەبینین هەركام لە شوێنەوار (أَثَر)و عەقڵ (رَأي)، پشتیان پێ بەستراوە بۆ تەفسیركردنی قورئانی بەپێز.

**یازدەیەم: پلەو پایەو پاداشتی فێربوونو فێركردنی قورئان:**

هەڵبەتە لەوبارەوە ئایەتو فەرموودە زۆر زۆرن، بۆ نموونە:

١/ خوای پەروەردگار لە سوورەتی (الزمر)دا دەفەرموێ: ﴿ ٱللَّهُ نَزَّلَ أَحۡسَنَ ٱلۡحَدِيثِ كِتَٰبٗا مُّتَشَٰبِهٗا مَّثَانِيَ تَقۡشَعِرُّ مِنۡهُ جُلُودُ ٱلَّذِينَ يَخۡشَوۡنَ رَبَّهُمۡ ثُمَّ تَلِينُ جُلُودُهُمۡ وَقُلُوبُهُمۡ إِلَىٰ ذِكۡرِ ٱللَّهِۚ ذَٰلِكَ هُدَى ٱللَّهِ يَهۡدِي بِهِۦ مَن يَشَآءُۚ وَمَن يُضۡلِلِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِنۡ هَادٍ ﴿٢٣﴾ ﴾، واتە: خوا باشترین فەرمایشتی ناردۆتە خوار (هەموو فەرمایشتەكانی خواو هەموو كتێبەكانی خوا باشترین فەرمایشت بوون، بەڵام قورئان بۆ بەشەرییەت لە دوا قۆناغی تەمەنیدا باشترین فەرمایشتی خوایە) كتێبێكە وەك یەك دەچێ، دووبارە دەكرێتەوە، ئەوانەی كە

لە پەروەردگاریان دەترسن بەهۆیەوە پێستیان ڕێكدێ (واتە: تەزوویان پێدادێت) دوایی پێستیان‌و دڵیان نەرم دەبێت بۆ یادی خوا، (ئەوەی كە خوا فەرموویەتی ئینسان ئەگەر تەجرەبەی بكات وایە، سەرەتا موچوڕكەت پێدادێت‌و دوایی وردە وردە دڵت نەرم دەبێت‌و خشووع دێتە نێو دڵت) ئەوە هیدایەتی خوایە، هەر كەسێ بیەوێ پێی ڕێنمایی دەكات، وە یەكێك خوا گومڕای بكات، كەس نیە ڕای كێشێ‌و لە گومڕایی دەریبێنێ هیدایەتی بدات، واتە: كەسێك لە قورئان دووربێ مانای وایە گومڕایە، بەڵام ئەو كەسە كە ئاوا تەفاعول لەگەڵ قورئاندا دەكات؛ دەیخوێنێتەوە لێی تێدەگاو كاری تێدەكات. لەڕاستیدا ئەو كەسە ڕێگای ڕاستی گرتوە.

٢/ پێغەمبەر ﷺ لە فەرمایشتێكدا فەرموویەتی: {(خَيْرُكُمْ مَنْ تَعَلَّمَ الْقُرْآنَ وَعَلَّمَهُ) (رَوَاهُ الْبُخَارِي برقم: (٥٠٢٧)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (١٤٥٢)، والتِّرمِذِيُّ برقم: (٢٩٠٧)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٢١٣)، عَنْ عُثمان بن عَفَّانَ رضي الله عنه)، واتە: باشترینی ئێوە كەسێكە، كە قورئان فێربێ، وە قورئان فێری خەڵكی بكات، لێرەدا وشەی (تَعَلَّمَ الْقُرْآنَ وَعَلَّمَهُ) مەبەست بەس خوێندنی نیە، بەڵكو مانای فێربێ‌و، یاساكانی فێربێ‌و، چۆنیەتی كارپێكردنی فێربێ‌و، چۆنیەتی هیدایەت پێدانی فێربێ، هەمووی دەگرێتەوە.

٣/ هەروەها لە فەرمایشتەكی دیكەدا پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {(الْمَاهِرُ بِالْقُرْآنِ مَعَ السَّفَرَةِ الْكِرَامِ الْبَرَرَةِ، وَالَّذِي يَقْرَأُ الْقُرْآنَ وَيَتَتَعْتَعُ فِيهِ، وَهُوَ عَلَيْهِ شَاقٌّ، لَهُ أَجْرَانِ) (رَوَاهُ مُسْلِمٌ برقم: (١٨٥٩)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٣٧٧٩)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٧٦٧)، والتِّرمِذِيّ برقم: (٢٩٠٤)، عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا)، واتە: كەسێك كە ماهرو كارامەیە لە قورئاندا (لە خوێندنیدا لە تێگەیشتنیدا) ئەوە لەگەڵ ئەو فریشتانەیە، كە نوێنەرە چاكەكارە بەڕێزەكانی خوان (خوا دەیاننێرێ بۆئەوەی كە وەحییان پێدا بنێرێ)، ئەوەش كە دەیخوێنێ بەڵام لەسەر زمانی ڕاست نایەو پێشی ناخۆشە (واتە: چاك نایزانێ)، ئەوە دوو

پاداشتی هەیە (پاداشتی خوێندنی‌و پاداشتی ئەوەش کە لەسەر دڵی قورسە، هەرچەندە دەیکات فێری نابێ، کەواتە با ئەویش هەر خەریکبێ).

٤/ لە فەرمایشتێکی دیکەدا پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {(يُقَالُ لِصَاحِبِ الْقُرْآنِ إِذَا دَخَلَ الجنَّةَ: إقرأْ وَاصْعَد، فيَقْرَأَ وَيَصْعَدُ بِكُلِّ آيَةٍ دَرَجَةً حَتَّى يَقْرَأَ آخِرَ شَيْءٍ مَعَهُ) (رَوَاهُ أَحْمَد برقم: (١١٢٩٩)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٣٧٨٠)، عَنْ أَبي سَعيدٍ الخُدريّ ﷺ، وَصَحَّحَهُ الأَلباني في (السلسلة الصحيحة) برقم: (٢٢٤٠)}، واتە: کاتێ ئینسانی ئیماندار دەچێتە بەهەشت پێی دەگوترێ: بخوێنەو بەرزبەوەو سەربکەوە، ئیدی هەر دەخوێنێ‌و سەردەکەوێ، بە هەموو ئایەتێك پلەیەك، هەتا دوا ئایەتی پێیەتی (واتە: تا ئاستی دوا ئایەت، کە لەبەریەتی‌و تێیگەیشتوەو دەیخوێنێ، هەر بەرز دەبێتەوە).

خوای بەبەزەیی لەو کەسانەمان بگێڕێ، کە بەهۆی کتێبی خواوە بەرزدەبنەوە.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی دووەم

## تەفسیری سووڕەتی (الفاتحة)

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان تەرخان کردوە بۆ تەفسیری سووڕەتی فاتیحە، بەڵام بەر لەوەی بچینە سەر دەستپێکردنی تەفسیری سووڕەتی فاتیحە، خستنەڕووی سێ مەسەلە بە پێویست دەزانم:

یەکەم: حوکمی (إستعاذة) کردن:

گوتنی (أعُوذُ باللهِ مِنَ الشَّيطانِ الرَّجيم) لە سەرەتای دەستپێکردنی قورئان خوێندن، چ بە صیغەی: (أعُوذُ باللهِ مِنَ الشَّيطانِ الرَّجيم)، چ بە صیغەی: {(أعُوذُ باللهِ السَّميعِ العَليم مِنَ الشَيطَانِ الرَجيم)، چ بە صیغەی: (أعُوذُ باللهِ السَمِيعِ العَليم مِنَ الشَّيطَانِ الرَّجيم، مِنْ هَمْزِهِ وَنفْخِهِ وَنفْثِهِ)}، کە هەرکام لە سێ صیغەکان بەشێك لە زانایان هەڵیانبژاردوە، هەموو زانایان لەسەر ئەوە یەك دەنگن، کە ئەگەر فەڕزیش نەبێ، سوننەتە کە هەر کاتێك ئینسان دەست بە قورئان خوێندن بکات، لە سەرەتاکەیەوە (إستعاذة) بکات، (إستعاذة)ش واتە: گوتنی (أعُوذُ باللهِ مِنَ الشَّيطانِ الرَّجيم)، چونکە خوای زاناو شارەزا لە سووڕەتی (النحل) ئایەتی (٩٨)دا زۆر بەڕوونیی دەفەرموێ: ﴿ فَإِذَا قَرَأۡتَ ٱلۡقُرۡءَانَ فَٱسۡتَعِذۡ بِٱللَّهِ مِنَ ٱلشَّيۡطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ ﴾، واتە: هەرکاتێك قورئانت خوێند، پەنا بەرە بەر خوا لە شەیتانی نەفرین لێکراو، واتە: بڵێ: (أعُوذُ باللهِ مِنَ الشَّيطانِ الرَّجيم) پەنا دەگرم بە خوا لە شەیتانی دوورخراوە، یاخود شەیتانی نەفرین لێکراو، شایانی باسیشە لەوبارەوە فەرمووده زۆرن، کە پێویستە، یان لانیکەم سوننەتە بەر لە

دەستپێکردنی قورئان خوێندن، (إستعاذة) بکرێ، بۆ نموونە: {(عَن أبي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا قَامَ مِنَ اللَّيْلِ فَاسْتَفْتَحَ صَلاَتَهُ وكَبَّر قَالَ: (سُبحانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ وَتَبَارَكَ اسمكَ وَتَعَالى جِدُّكَ وَلا إِلَهَ غَيْرُكَ ثُمَّ يَقُولُ: لاَ إِلَهَ إلاَّ الله، ثُمَّ يَقُولُ: أَعُوذُ بِاللهِ السَّمِيعِ العَلِيم مِنَ الشَّيطَانِ الرَّجيم مِنْ هَمْزِهِ وَنَفْخهِ وَنفْثهِ) (رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ برقم: (٧٧٥)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٢٤٢)، وَالنَّسَائِيُّ برقم: (٨٩٩)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٨٠٤)، وَصَحَّحَهُ الأَلباني في (إرواء الغليل) برقم: (٣٤١)، وقَالَ التِّرمِذِيُّ: هُوَ أَشهَرُ شَيءٍ في هَذَا البَاب}، واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ کە شەوێ هەڵدەستا بۆ نوێژێ، دەستپێدەکردو (اللهُ أكبر)ی دەکرد، دەیفەرموو: ئەی خوایە پاکیی بۆ تۆو ستایشت دەکەم، وە ناوت بەرزو بەپێزەو پایەت بەرزەو، جگە لەتۆ هیچ پەرستراو نین، ئنجا سێ کەڕەتان دەیفەرموو: بێجگە لە خوا هیچ پەرستراو نین، پاشان دەیفەرموو: پەنا بەخوای بیسەری زانا دەگرم لە شەیتانی نەفرینکراو، لە خنکاندنو خوتخوتەیو، خۆ بەزلگریی فێرکردنیو، شیعری (خراپ) فێرکردنی. (الهَمْزُ: الخَنْق، النَّفْخُ: الكِبر، النَّفْث: الشّعر).

{عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ صُرَدٍ، قَالَ: اسْتَبَّ رَجُلاَنِ عِنْدَ النَّبيِّ ﷺ، ونَحْنُ عِنْدَهُ جُلُوسٌ، وأَحَدُهُما يَسُبُّ صَاحِبَهُ مُغْضَباً قَدِ احْمَرَّ وَجْهُهُ، فَقَالَ: النَّبيُّ ﷺ: (إنِّي لأَعْلَمُ كَلِمَةً، لَوْ قَالَهَا لَذَهَبَ عَنْهُ مايَجِدُ، لَوْ قَالَ: أعُوذُ بِاللهِ مِنَ الشَّيطانَ الرَّجيم)...} (رَوَاهُ البُخَارِيُّ برقم: (٦١١٥)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٦٥٩٠)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٤٧٨١)، واتە: دوو پیاو لەلای پێغەمبەر ﷺ کە ئێمەش لەلای دانیشتبووین، قسەیان بەیەکدی گوت، جا یەکیان جنێوی بە هاوەڵەکەیدا بەتووڕەییو ڕووی سوورهەڵگەڕاوەیی، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: من قسەیەك دەزانم ئەگەر بیڵێ ئەو حاڵەتەی نامێنێ، ئەگەر بڵێ: پەنا بەخوا دەگرم لە شەیتانی دوور خراوە.

شایانی باسیشە، کە زانایان لەوبارەوە ڕاجیاییان هەیە، کە ئایا خوێندنی (إستعاذة) پێش هەر قورئان خوێندنێك، پێویست یان سوننەتە یان نا؟

بەڵام بەپێی ئایەتی: ﴿ فَإِذَا قَرَأْتَ ٱلْقُرْءَانَ فَٱسْتَعِذْ بِٱللَّهِ مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ ﴿٩٨﴾ ﴾ النحل، وا دیارە بەر لەهەر قور[illegible] لە نوێژداو لە دەرەوەی نوێژدا، بەڵام لە نوێژدا بەس لە ڕكاتی یەكەمدا.



دووەم: پایەو پێناسەی ئەم سوورەتە:

سوورەتی فاتیحە وەك ڕیزبەندیی (مـصحف) یەكەمین سوورەتە، بەڵام وەك ڕیزبەندیی هاتنە خوارەوە، یەكەمین سوورەت نیە، وە سوورەتی فاتیحە ئەگەر بمانەوێ بەكورتیی پێناسەی بكەین، دەڵێین:

سوورەتی فاتیحە سوورەتێكی مەككەییەو حەوت ئایەتەو گەورەترین سوورەتی قورئانیشە، دیارە لە ڕووی قەبارەوە نا بەڵكو لەڕووی نێوەڕۆكەوە، جا ئێمە بە سەرنجدانی خودی فاتیحەو ئەم چەند فەرمایشتەی پێغەمبەریش ﷺ، هەموو ئەو ڕاستییانەی كە گوتمان دەربارەی سوورەتی فاتیحە بۆمان دەردەكەون، كە هەم سوورەتێكی مەككییەو هەم حەوت ئایەتەو هەم گەورەترین سوورەتە:

فەرمایشتی یەكەم: {(عَنْ أَبِي سَعِيدِ بْنِ الْمُعَلَّى رضي الله عنه، قَالَ: كُنْتُ أُصَلِّي فِي الْمَسْجِدِ فَدَعَانِي النَّبِيُّ ﷺ فَلَمْ أُجِبْهُ، حَتَّى صَلَّيْتُ، قَالَ: فَأَتَيْتُهُ فَقَالَ: مَا مَنَعَكَ أَنْ تَأْتِيَنِي؟ قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ إِنِّي كُنْتُ أُصَلِّي، قَالَ: أَلَمْ يَقُلِ اللهُ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱسْتَجِيبُواْ لِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ إِذَا دَعَاكُمْ لِمَا يُحْيِيكُمْ ... ﴿٢٤﴾ ﴾ الأنفال، ثُمَّ قَالَ لِي: لأُعَلِّمَنَّكَ أَعْظَمَ سُورَةٍ فِي الْقُرْآنِ قَبْلَ أَنْ تَخْرُجَ مِنَ الْمَسْجِدِ؟ قَالَ: فَأَخَذَ بِيَدِي فَلَمَّا أَرَادَ أَنْ يَخْرُجَ مِنَ الْمَسْجِدِ قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ إِنَّكَ قُلْتَ لأُعَلِّمَنَّكَ أَعْظَمَ سُورَةٍ فِي الْقُرْآنِ، قَالَ: نَعَمْ، ﴿ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾، هِيَ السَّبْعُ الْمَثَانِي وَالْقُرْآنُ الْعَظِيمُ الَّذِي أُوتِيتُهُ) (رَوَاهُ الْبُخَارِيُّ بِرقم: (٤٤٧٤)، وَأَبُو دَاوُدَ بِرقم: (١٤٥٨)، وَالنَّسَائِيُّ بِرقم: (٩١٢)، وَابْنُ مَاجَهْ بِرقم: (٣٧٨٥)}، واتە: (أبي سَعِيدِ بْنِ الْمُعَلَّي) خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ: ڕۆژێك لە مزگەوت نوێژم دەكرد پێغەمبەر ﷺ بانگی كردم، لە نوێژدا بووم و

وەڵامم نەدایەوە، دوای ئەوەی لێی بوومەوە چوومە لای عوزرم بۆ هێنایەوە گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من لە نوێژدا بووم، فەرمووی: ئەدی خوا نەیفەرمووە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! بەدەم بانگی خواو پێغەمبەرەکەیەوە بچن هەرکات بانگیان کردن بۆ ئەوەی کە زیندووتان دەکاتەوە (واتە: لە نوێژیشدا بۆت هەبوو کە وەڵامم بدەیەوە) دەڵێ: دوایی پێی فەرمووم: سوورەتێکت فێردەکەم گەورەترین سوورەتی قورئانە، پێش ئەوەی لە مزگەوت بچینە دەرێ، دوایی دەستی گرتم و پێش ئەوەی لە مزگەوت بچینە دەرێ گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ئەدی نەتفەرموو گەورەترین سوورەتت فێردەکەم لە قورئان؟ فەرمووی: بەڵێ، ﴿ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴾، (واتە: سوورەتی فاتیحە) بریتیە لە حەوت ئایەتە دووبارەکراوەکان، وە قورئانی مەزن کە پێم دراوە. بەپێی ئەم فەرمایشتە قورئانی مەزن (الْقُرْآن الْعَظِيم)یش دەبێتە سیفەت و وەسف بۆ سوورەتی فاتیحە، وەك چۆن بە (السَّبْعَ الْمَثَانِي)یش وەسف کراوە.

ئنجا چۆنیەتی بەڵگەبوونی ئەم فەرمایشتە لەسەرئەوە، کە سوورەتی فاتیحە مەککییەو لە مەککە هاتۆتە خوار - چونکە هەندێك لە زانایان دەڵێن: مەدەنییە- ئەوەیە، کە ئەم ڕستە قورئانییە: ﴿ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَـٰكَ سَبْعًا مِّنَ ٱلْمَثَانِى وَٱلْقُرْءَانَ ٱلْعَظِيمَ ﴿٨٧﴾ ﴾ ئایەتێکە لە سوورەتی (الحجر)، وە سوورەتی (الحجر)یش بە ڕای هەموو توێژەرەوان و زانایان سوورەتێکی مەککییە، ئنجا پێغەمبەر ﷺیش پێناسەی سوورەتی فاتیحە دەکات بە (السَّبْعَ الْمَثَانِي) هەڵبەتە سوورەتی فاتیحەش حەوت ئایەتە، وە دیارە پێشتریش خوای پەروەردگار پێش ئەوەی سوورەتی (الحجر)ی بۆ بنێرێ، سوورەتی فاتیحەی بۆ ناردوە، کە وەك خەبەر دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَـٰكَ سَبْعًا مِّنَ ٱلْمَثَانِى وَٱلْقُرْءَانَ ٱلْعَظِيمَ ﴿٨٧﴾ ﴾ الحجر، واتە: وە بێگومان بە تۆمان بەخشیوە حەوت ئایەتە دووبارە کراوەکان، وە قورئانی مەزن.



فەرمایشتی دووەم : کە نێوەڕۆکی سوورەتی فاتیحەو گەورەیی دەردەخات، ئەو فەرمایشتەیە کە ئوبەی کوڕی کەعب دەیگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {(وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ مَا أَنْزَلَ اللَّهُ ﷻ فِي التَّوْرَاةِ وَلا فِي الإِنْجِيلِ وَلا فِي الزَّبُورِ وَلاَ فِي الْفُرْقَانِ مِثْلَهَا وَإِنَّهَا لَلسَّبْعُ مِنْ الْمَثَانِي) (رَوَاهُ أَحْمَد بِرقم: (٨٦٦٧)، والتِّرمِذِيُّ بِرقم: (٢٨٧٥)، وَصَحَّحَهُ الألباني}، واتە: سوێند بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە، خوای زاڵو شکۆدار نە لە تەوراتدا نە لە ئینجیلدا نە لە زەبووردا نە لە فورقاندا (فورقان واتە: قورئان) وێنەی دایکی قورئان (فاتیحە)ی نەناردۆتە خوار، ئەویش بریتیە لە حەوت ئایەتە دووبارەکراوەکان.

فەرمایشتی سێیەم : کە بەڵگەو نیشانەی گەورەیی یاخود گەورەتربوونی سوورەتی فاتیحەیە، ئەوەیە کە موسلیم لە ئەبوو هورەیرەوە خوا لێی ڕازی بێ، دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {(مَنْ صَلَّى صَلاَةً لَمْ يَقْرَأْ فِيهَا بِأُمِّ الْقُرْآنِ فَهِيَ خِدَاجٌ، (ثلاثاً) غَيْرُ تَمَامٍ)) (رَوَاهُ مُسْلِمٌ بِرقم: (٨٧٦)}، واتە: هەرکەسێك نوێژ بکات سوورەتی فاتیحەی تێدا نەخوێنێ {یەکێ لە ناوەکانی سوورەتی فاتیحە بریتیە لە (أُمِّ الْقُرْآنِ)} ئەوە نوێژەکەی ناتەواوە، نوێژەکەی ناتەواوە، نوێژەکەی ناتەواوە، وە دوایش بۆ دڵنیایی فەرمووی: (غَيْرُ تَمَامٍ) واتە: نوێژەکەی ناتەواوە، هەر بۆیەش زۆر لە زانایان جگە لە (أبوحنیفة) ڕەحمەتی خوایان لێبێ ڕایان وایە، کە لە هەموو ڕکاتێکدا فەرزە سوورەتی فاتحە بخوێندرێ، ئەگەرنا ئەو نوێژە بەرناکەوێ.

فەرمایشتی چوارەم: {(عَنْ أَبِي هُرَيرَةَ ﵁، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ: قَالَ اللهُ تَعَالَى: قَسَمْتُ الصَّلاَةَ بَيْنِى وَبَيْنَ عَبْدِى نِصْفَيْنِ، وَلِعَبْدِى مَا سَأَلَ، فَإِذَا قَالَ الْعَبْدُ: ﴿ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾، قَالَ اللهُ تعالى: حَمِدَنِي عَبْدِي، وَإِذَا قَالَ: ﴿ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴾، قَالَ اللهُ تعالى: أَثْنى عَلَيَّ عَبدِي، فَإِذَا قَالَ: ﴿ مَٰلِكِ يَوْمِ ٱلدِّينِ ﴾، قَالَ: مَجَّدَنِي عَبْدِي - وَقَالَ مَرَّةً: فَوَّضَ إِلَيَّ عَبْدِي - فَإِذَا قَالَ: ﴿ إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ ﴾، قَالَ: هَذَا بَيْنِي وَبَيْنَ عَبدِي،

وَلِعَبدِي مَاسَأَلَ، فَإِذَا قَالَ: ﴿ اهْدِنَا الصِّرَاطَ الْمُسْتَقِيمَ ۝٦ صِرَاطَ الَّذِينَ أَنْعَمْتَ عَلَيْهِمْ غَيْرِ الْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلَا الضَّالِّينَ ۝٧ ﴾ قَالَ اللهُ: هَذَا لِعَبدِي وَلِعَبدِي مَا سَأَلَ)) (رَوَاهُ مُسْلِمٌ بِرقم: (٨٧٦)} . ئەم فەرمایشتەش بەڕاستی وەك فەرمایشتەکانی پێشێ، بەلگەو دەلیلێکی گەورەیە لەسەر ئەوە، کە سوورەتی فاتیحە گەورەترین سوورەتە.



چونکە خوای بەرز سوورەتی فاتیحەی داناوە بە هەموو نوێژ، وەك فەرموویەتی: (قَسَمْتُ الصَلاةَ بَينِي وَبَينَ عَبدِي) دوایی باسی سوورەتی فاتیحە دەکات، کەواتە: بەشی زۆری نوێژ، وە بناغەی نوێژو گەورەترین و پایەی نوێژ، بریتیە لە خوێندنی سوورەتی فاتیحە، مانای حەدیسەکەش بەم شێوەیە:

واتە: خوا ﷻ دەفەرموێ: نوێژم لەنێوان خۆم و بەندەکەمدا کردۆتە دوو بەش، وە بۆ بەندەی من هەیە هەر شتێك کە لێم داوا بکات، جا هەرکاتێ بەندە گوتی: ﴿ الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ ﴾، خوا دەفەرموێ: بەندەکەم ستایشی کردم، وە هەرکات گوتی: ﴿ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ ﴾، خوا دەفەرموێ: بەندەکەم مەدحی منی کرد، وە هەرکات گوتی: ﴿ مَالِكِ يَوْمِ الدِّينِ ﴾، خوا دەفەرموێ: بەندەی من منی بە خاوەن شکۆو پایەبەرز وەسف کرد، وە جارێك فەرمووی: ئیشوکاری خۆی بەمن سپارد، وە کاتێ گوتی: ﴿ إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ ﴾، خوا دەفەرموێ: ئەوە لە نێوانی من و بەندەکەم دایەو، بەندەکەم هەر شتێکم لێ داوا بکات، بۆی دەبێ (واتە: مادام منی بەو مەدح و وەسفانە وەسف کرد، لەوەودوا هەر شتێکم لێ داوا بکا دەیدەمێ و پێی دەبەخشم)، وە هەرکات بەندە گوتی: ﴿ اهْدِنَا الصِّرَاطَ الْمُسْتَقِيمَ ۝٦ صِرَاطَ الَّذِينَ أَنْعَمْتَ عَلَيْهِمْ غَيْرِ الْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلَا الضَّالِّينَ ۝٧ ﴾ ، خوا دەفەرموێ: ئەوە بۆ بەندەکەمە، وە بەندەی من هەر شتێکم لێ داوا بکات پێی دەبەخشم، (دیارە ئێمە دوایی دێینە سەر

تەفسیری سوورەتی فاتیحە، بەڵام جارێ هەر مەبەستم ئەوە بوو بۆتان ڕوون بکەمەوە کە سوورەتی فاتیحە بۆناسەکەی چییەو بۆچی گەورەترین سوورەتە؟ وە چۆن ئیسپاتی دەکەین کە سوورەتێکی مەککییەو حەوت ئایەتە؟ بەم فەرمایشتانە ئەمانە هەموویان دەرکەوتن).



سێیەم: باسێك لەبارەی ﴿ بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴾ەوە:

دەربارەی ﴿ بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴾، ئەوە کە ئایا ئایەتێکە لە سوورەتی فاتیحەو لە هەرکام لە سوورەتەکانی دیکەش، یاخود تەنیا لە سوورەتی فاتیحەدا ئایەتە؟! پاشان ئایا ئایەتێکە لەڕیزی حەوت ئایەتەکانی سوورەتی (الفاتحە) ئیەتەکانی سوورەتەکانی دیکەشدا، یاخود هەر ئایەتێکە خوای زانا بۆ لێك جوداکردنەوەی سوورەتەکان دایناوە؟ زانایان لە هەموو ئەو بوارانەدا ڕایان جیایەو هەندێك دەڵێن: ئایەتێکە هەم لە سوورەتی فاتیحەو هەم لە هەرکام لە سوورەتەکانی دیکەش، وە بەڵگەشیان ئەوەیە کە مادام لە (مصحف)دا لە پێش فاتیحەو هەموو سوورەتەکانی دیکەشدا هەیە، کەواتە: ئایەتێکە لە هەر کامێکیان، وە منیش بە حەقیقەت هەر ئەم ڕایەم بەدڵە، وە هەندێکیان دەڵێن: ئایەتێکە لە سوورەتی فاتیحە، بەڵام بۆ سوورەتەکانی دیکە ئایەتێك نیە لەوان، واتە لەڕیزی ئایەتەکانیاندا نیە، بەڵام هەر ئایەتێکە خوا دایناوە لەپێش هەر سوورەتێکەوە، واتە ئایەتێکی سەربەخۆ (مستقل)یە.

هەڵبەتە هەموویان لەسەر ئەوە یەکدەنگن کە: ﴿ بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴾، بەو ژمارەیەی کە هاتوە - کە (١١٤)یە - بەشێکە لە قورئان، جا ئایا ئایەتێکی سەربەخۆیەو ڕەبتی نیە بە سوورەتەکانەوە، یاخود ئایەتێکەو ڕەبتی بە هەرکام سوورەتەکانەوە هەیە؟ ئەوە شتێکی وا لە بابەتەکە ناگۆڕێ، شایانی باسیشە قورئان خوێنەکانی مەککەو کووفە دەڵێن: ئایەتێکە لە فاتیحەو لە غەیری فاتیحەش لە هەموو سوورەتەکان[1].

---

١) بڕوانە: (المصباح المنير في تهذيب تفسير إبن كثير) ، ص (١٩) .

بـەڵام قورئــان خوێنــانی مەدینــەو شــام و بەصــرە گوتوویانــە: ئایــەتێکی نێــو سووڕەتەکان نیـە، بـەڵکو ئایەتێکە لـە قورئان بۆ لێك جیاکردنەوەی نێـوانی سووڕەتەکان.



ئنجا ئایـا ﴿ بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴾، وا باشـە بـەدەنگی بـەرز بگـوترێ لـە سەرەتای فاتیحەو لە سەرەتای سووڕەتەکانی دیکەشدا، یان بە دەنگی نزم؟! دیسان هـەردوو ڕایـەکان هـەن، بەڵگە لەسـەر ئـەوەی، کـە بـەدەنگی بـەرز بخوێنرێ. ئـەم گێڕانەوەیە هەیە: ((سُئِلَ عَن أَنَسٍ قِراءَةَ رَسُولِ اللهِ ﷺ فَقَالَ: كَانَتْ قِرَاءَتُهُ مَدًّا ثُمَّ قَـرَأَ بـ﴿ بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴾ يَمُـدُّ ﴿ بِسۡمِ ٱللَّهِ ﴾ ، ويَمُـدُّ ﴿ ٱلرَّحۡمَٰنِ ﴾ ويَمدُ ﴿ ٱلرَّحِيمِ ﴾)) (رَوَاهُ البُخاري)، واتە: پرسیار لە ئەنەسی کوڕی مالیك کراوە خوا لێی ڕازی بێ دەربارەی قورئان خوێندنی پێغەمبەر ﷺ، ئـەویش گوتوویـەتی: پێغەمبەر ﷺ خوێندنەوەکەی لێك دەکێشـایەوە، (واتە بـەڕێوجێ بـوو، مەبەسـتی هەر ئەوەیە، نەك زیاد لە ئەندازەی کە لـە تەجویـددا هاتوە لێك بکێشـرێتەوە)، ئنجا ئەنەس تەقلیدی پێغەمبەری ﷺ کرد ﴿ بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴾ی خوێند ﴿ بِسۡمِ ٱللَّهِ ﴾ ی درێـــژکردەوە، وە ﴿ ٱلرَّحۡمَٰنِ ﴾ی درێـــژکردەوە، وە﴿ ٱلرَّحِيمِ ﴾ی درێـژکردەوە، جـا کەواتـە: ئەنـەس لێـرەدا کـە دەڵێ پێغەمبـەر ﷺ ئـاوا قورئـانی خوێنـــدوە، مانای وایە کاتێ قورئانی خوێنـــدوە لـە نوێـژو غـەیری نوێـژدا، دیارە ﴿ بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴾ی بەدەنگی بەرز خوێنـدوە، وەك چۆن ئەنـەس دەڵێ ئاوای خوێندوە، ئەگەرنا نەیدەتوانی لاسایی بکاتەوە.

هـەروەها بـۆ بارەکـەی دیکەشـیان لـە (صـحیح)ی بوخـاریی‌و موسـلیمدا هـەر لـە ئەنەسەوە خوا لێی ڕازی بێ هـاتوە، کـە گوتوویـەتی: {(صَلَّيتُ خَلْفَ النَّبِــيِّ ﷺ، وَأَبي بَكْرٍ، وعُمَرَ، وَعُثمَانَ، فَكَانُوا يَسْـتفتِحُونَ بـ﴿ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴾) (رَوَاهُ البُخَارِيُّ برقم: (٧٤٣)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٨٩٠))}، واتـە: لـەدوای پێغەمبـەر ﷺو ئەبوبـەکرو عومـەرو عوسمانــەوە نوێــژم کــرد، یەکـسەر کـە دەسـتیان بـە دەنـگ

پێبەرزکردنەوەی قورئان دەکرد، بە ﴿ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴾ دەستیان پێ دەکرد، واتە: ﴿ بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَـٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴾ یان بەدەنگی بەرز نەدەخوێند، دیارە بەدەنگی بەرز گوترانی ﴿ بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَـٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴾ مانای وانیە بەدەنگی نزم ناگوترێ، بەڵکو یانی: بەدەنگی بەرز گوتنی سوننەت نیە، دیارە بەشێك لە زانایان ڕایان وایە کەوا باشترە بەدەنگی بەرز بگوترێو، هەندێك لە زانایانیش ئەوەیان تەرجیح داوە کە بە دەنگی نزم بگوترێ، منیش پێم وایە کە واباشە جارجار بەدەنگی بەرز بگوترێ، بەڵام بە زۆری بەدەنگی نزم بگوترێ، چونکە زۆربەی فەرمایشتەکان وادەگەیەنن.

ئێستاش ڕاستەوخۆ دەچینە سەر لێکدانەوەی سوورەتی فاتیحە:



﴿ بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴿١﴾ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٢﴾ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴿٣﴾ مَٰلِكِ يَوْمِ ٱلدِّينِ ﴿٤﴾ إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ ﴿٥﴾ ٱهْدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلْمُسْتَقِيمَ ﴿٦﴾ صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنْعَمْتَ عَلَيْهِمْ غَيْرِ ٱلْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ ﴿٧﴾ ﴾

## مانای وشە بە وشەی ئایەتەکان

((بە ناوی خوای بەبەزەیی بەخشندە ﴿١﴾ ستایش بۆ خوای پەروەردگاری جیهانەکان ﴿٢﴾ بە بەزەیی بەخشندەیە ﴿٣﴾ خاوەنی ڕۆژی سزاو پاداشتە ﴿٤﴾ هەر تۆ دەپەرستین‌و یارمەتی بەس لە تۆ دەخوازین ﴿٥﴾ ڕێنماییمان بکە، بۆ ڕێی ڕاست ﴿٦﴾ ڕێی ئەوانەی چاکەت لەگەڵدا کردوون، نەک لێ تووڕەبووان، وە نەک گومڕایان ﴿٧﴾)).

## باسێک دەربارەی گوتنی: ( آمین ) دوای سوورەتی فاتیحە

لە دوای خوێندنی سوورەتی فاتیحە، گوتنی: (آمین) - کە بە مانای (إستَجِب) وەری بگرە، قبووڵی بکە‌یە - یەکێکە لەو سوننەتانەی کە پێغەمبەر ﷺ داکۆکیی لەسەر کردوون، وە ئەوە لە چەند فەرمایشتێکدا باسکراوە، بۆ نموونە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {(إذَا أمَّنَ الإمَامُ فَأَمِّنوا، فَإِنَّهُ مَنْ وَافَقَ تأمِينُهُ تأمِينَ المَلائِكَةِ، غُفِرَ لَهُ مَا تقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ) (رَوَاهُ مالك برقم: (١٩٨)، وَأَحْمَد برقم: (٩٨٨٣)، وَالبُخَارِيُّ برقم: (٧٨٠)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٩١٤)، والتِّرمِذِيّ برقم: (٢٥٠)، وَالنَّسَائِيُّ برقم: (٩٢٨)، عَنْ أَبي هُرَيرَةَ رضي الله عنه}، واتە: هەر کاتێک ئیمام ئامینی گوت: ئێوەش لەگەڵی بڵێن ئامین، هەر نوێژکەرێک ئامین گوتنەکەی ڕێک دەرچێ

لەگەڵ هی فریشتەكان، ئەوە هەرچی گوناهی ڕابردوویەتی دەپۆشرێ، (واتە: كاتێ ئیمام دەڵێ ئامین، فریشتەكانیش ئامین دەڵێن).



فەرمایشتێكی دیكە: {((عَنْ وَائِلِ بْنِ حُجْرٍ ﷺ، قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ قَرَأَ: ﴿غَيْرِ ٱلْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ﴾، فَقَالَ: (آمِينَ) مَدَّ بِهَا صَوْتَهُ)) (رَوَاهُ أبوداود برقم: (٩٣٢)، والتِّرمِذِيُّ برقم: (٢٤٨)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٨٥٥)، ولأبي داود: رَفَعَ بِهَا صَوْتَهُ، قَالَ شعيب الأَرنؤوط: إسناده صحيح، رجالُهُ ثقات رجالُ الشَيْخَين)}، واتە: وائیلی كوڕی حوجەر خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا بوو ﷺ دوای ئەوەی سوورەتی فاتیحەی خوێندو گەیشتە: ﴿غَيْرِ ٱلْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ﴾، فەرمووی: ئامین، وە دەنگی پێ درێژكردەوە، لە ڕیوایەتی ئەبو داوددا دەڵێ: دەنگی پێ بەرزكردەوە، چونكە لەوەشدا ڕاجیایی هەیە كە: ئایا سوننەتە ئیمامیش دەنگ بەرز بكاتەوە، یان هەر مەئموونەكان دەنگ بەرز بكەنەوە؟ ڕای بەهێزتر ئەوەیە: بەڵێ ئیمامیش لەگەڵ مەئموونەكان پێكەوە هەموویان دەنگیان بەرزبكەنەوە بەگوتنی وشەی ئامین، بەڵام بە دڵنیاییەوە وشەی ئامین بەشێك نیە لە قورئان، بەڵكو ئەمە فەرمایشتی پێغەمبەرە ﷺ، وە حیكمەتەكەشی ئەوەیە، كە سوورەتی فاتیحە هەمووی پاڕانەوەو وە داواكردنە لە خواو لە كۆتاییدا دەڵێ: خوایە گیرای بكە، لێمان وەربگرە.

## شیكردنەوەی هەندێك لە وشەكان

(ٱللَّهِ): (قِيلَ: أصلُهُ (إلـه) فَحُذِفَت هَمْزَتُهُ، وَأدخلَ عَلَيهَا الألِفَ وَاللام فَخُصَّ بالباري تعالى) واتە: (الله) گوتراوە لە ئەسڵدا لە (إلـه)ەوە هاتوە هەمزەكەی لابراوە (ال) ئەلیفو لامێكی خراوەتە سەر بۆ ئەوەی ببێتە ناوی (عَلَم) ناوی ناسێنەر بۆ خوا ﷻ وە تایبەتیشە بەخواوە. هەندێكیش دەڵێن هەر (اسم)ێكی (جامد)ەو لە (إلَه)ەوە نەهاتوە. بە هەرحاڵ ئەو دوو ڕایە هەن. كە یەكێكیان

دەڵێ: (اللّه) ناوێكی وەرگیراو (مشتق)و ئەوەی دیكەش دەڵێ: (جامد)ەو لە هیچ وەرنەگیراوە، ئەوەی من مەبەستمە بیڵێم ئەوەیە كە وشەی (اللّه) كە  لە كوردیدا ئێمە دەڵێین (خوا) لە ئینگلیزیدا دەڵێن: (گەد)، لە فارسیدا دەڵێن: (خُدا)، لەگەڵ وشەی (إلَـه) كە بەمانای پەرستراو (مَعْبُود) دێت، لێك جیان، كە بەداخەوە زۆر لە وتارخوێنەكان فەرقیان پێ ناكەن، بۆ وێنە: دەڵێن: (لا إلَـه إلاَّ اللّه) واتە: بێجگە لە خوا هیچ خوا نین! كە ئەوە هیچ مانای نیە، چونكە خوا ﷻ لە یەك ئایەتیش لە قورئاندا، نەیویستوە ئیسپاتی ئەوە بكات كە بوون (وجود)ی هەیە، بەڵكو ویستوویەتی ئیسپاتی ئەوە بكات كە هەر ئەو پەروەردگارەو خاوەنی هەموو ناو سیفەتە چاكەكانەو، دەبێ هەر ئەو بپەرسترێ، بەڵام نەیفەرمووە لای خەڵكی دیكە خوایەكی دیكەش هەیە، بەڵام نەخێر ئەو خوا نیەو هەر من خوام! بەڵكو قورئان هەمووی باسی یەكتایی ئولوهیەتی خوایە، ئەگەرنا ئەوە كە خوا ﷻ لە بەدیهێنەرایەتیدا هیچ هاوەڵی نین‌و تەنیا خۆی خوایە، جێگای مشتومڕ نەبووە، بەڵكو ئەوە كە دەبێ تەنیا خوا بپەرسترێ، جێگای مشتومڕ بووە، بۆیە مانای: (لا إلَـه إلاَّ اللّه)، واتە: بێجگە لە خوا هیچ پەرستراوێك نیە (لا مَعبُودَ بحَقٍ إلاَّ اللّه) ئەویش دیارە پەرستراوی بە هەق، ئەگەرنا پەرستراوی بەناهەق زۆرن!!

(ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ) : (الرَحمَـة مِـنَ اللّهِ الإفـضَالُ والإنعـامُ..) دیـارە (ٱلرَّحْمَٰنِ) و (ٱلرَّحِيمِ) لە سیفەتی ڕەحمەتی خوای پەروەردگارەوە هاتوون، ڕەحمەتیش لە خواوە بریتیە لە چاكە نواندن‌و نیعمەت ڕشتن بەسەر غەیردا.

(ٱلرَّحْمَٰنِ): لەسەر صیغەی (فعلان)ە، زانایان زۆر قسەیان لەبارەوە كردوە، بەڵام ئێمە ئێستا ماوە نیە هەموو شتێ باس بكەین‌و بەس دەڵێین: (رحمان) لەسەر صیغەی (فعلان)ەو بۆ تازەبوونەوە (تجدّد)یە، واتە: كەسێك كە چاكەو بەخششەكانی هەمیشە لە تازەبوونەوەدان.

(ٱلرَّحِيمِ ): (رحیم) لەسەر صیغەی (فعیل)ە بۆ جێگیربوون (ثبوت)ە، کەواتە:



(ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ) یانی: ئەو خوایەی کە خاوەن بەزەیی نوێبووەوەیە، وە خاوەنی بەزەیی بەردەوامە.

هەندێکیش دەڵێن: وشەی: (رحمان)، واتە: سیفەتی بەزەیی گشتی خوایەو هەموو کەس دەگرێتەوە، کافرو مسوڵمان .... بەڵام (رحیم)، واتە: سیفەتی تایبەتی بەزەیی خوا، کە تایبەتە بە ئەهلی ئیمانەوە: ﴿ ... وَكَانَ بِٱلۡمُؤۡمِنِينَ رَحِيمٗا ﴿٤٣﴾ ﴾ الأحزاب، ئنجا دیارە سیفەتی (رحمة) ئەگەر بۆ غەیری خوا بەکار بێ، بریتیە لە دڵ نەرمیی‌و بەزەیی‌و شەفەقەت، بەڵام ئەوە بۆ خوا ﷻ بەکار نایەت، چونکە ئەو جۆرە تەعبیرە ئیهامی ئەوە دەکات، کە خوای پەروەردگار تەن (جسم) بێت، دیارە خوای بەرزو مەزنیش ﴿ ... لَيۡسَ كَمِثۡلِهِۦ شَيۡءٞۖ ﴿١١﴾ ﴾ الشورى، واتە: هیچ شتێك وەك وێنەی خوا نیە.

(رَبِّ ): (الـرَّب فـي الأصـلِ: التَربيَـةَ وَهـوَ إنشـاءُ الشَـيءِ حَـالاً فحَـالاً إلـى حَدِّ التَمَـام) واتە: وشەی (رَبّ) لە ئەسڵدا لە تەربیەوە هاتوە، ئەمیش ئەوەیە کە شتێك قۆناغ بە قۆناغ پێبگەیەنی، هەتا ڕادەی کامڵبوون، خواش پەروەردگاری جیهانەکانە، واتە سەرپەرشتییان دەکات‌و مشووریان دەخوات پێیان دەگەیەنێ.

(ٱلۡعَٰلَمِينَ ): وشەی (عَـالَم) واتە: جۆرە مەخلووقێك، کە خاوەنی یەك جینس بن. وەك: عالەمی ئادەمیزاد، عالەمی جن، عالەمی فریشتە، عالەمی ڕووەك، عالەمی ژیانداران، عالەمی بێ ژیان، (عَالَمین)یش کۆیەکەیەتی، کە جگە لە خوا (مَـا سِوَى الله) دەگرێتەوە، کەواتە (ربِّ العَـالَمِين): واتە: پەروەردگاری غەیری خۆی، کە سەری‌و خواری، یان هەموو ئاسمانەکان‌و زەوی‌و ئەوەی نێوانیان دەگرێتەوە.

( مَٰلِكِ ): واتە (صَاحِب) خاوەن، بە (مَلِك)یش خوێنراوەتەوە، یانی: پادشا، حوکمڕان.

(يَوۡمِ ٱلدِّينِ ): (يَوْم) واتە: ڕۆژ، وە لە زمانی عارەبیدا (يَوْم) چەند مانایەکی هەیە، یەکێکیان ئەوەیە کە (١٢) سەعات یان (٢٤) سەعاتە. یەکێکیشیان بە مانای کات (زَمن) دێ بە ڕەهایی، کە لێرەدا ئەمەیان مەبەستەو (يَوۡمِ ٱلدِّينِ ) واتە: کاتو قۆناغی سزاو پاداشت، چونکە ( ٱلدِّينِ ) لێرەدا واتە: لێپرسینەوە سزاو پاداشت، ئەگەرنا وشەی: (ٱلدِّينِ) لە قورئاندا بە چەند مانایەك بەکارهاتوە، بەڵام لێرەدا بە مانای سزاو پاداشت (الجَزَاء)ە.

(إِيَّاكَ نَعۡبُدُ ): (العُبُودِيَّة: إظْهَارُ التَّذَلُّلِ، والعِبادَةُ أبْلَغُ مِنهَا، لأنَّها غَايَةُ التَّذَلُّلِ، وَلايَسْتَحِقُّهَا إلاّ مَنْ لَهُ غَايَةُ الإفْضَالِ، وَهو اللهُ تَعالى)، واتە: عیبادەت بریتیە لە نیشاندانی گەردن کەچیی بەڵام (عِبادَة) مانای ملکەچیی زیاتری تێدایە لە (عبُودِية)، وە هیچکەس شایستەی پەرستن (عِبادَة) نیە، مەگەر خاوەنی ئەوپەڕی چاکەکردن بێ، ئەویش بەس خوای بەرزە. دیارە دەگونجێ بەندایەتی (عبُودِية) بە ئیختیاریی بێتو دەشگونجێ بە ئیجباریی بێت ﴿إِن كُلُّ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ إِلَّآ ءَاتِي ٱلرَّحۡمَٰنِ عَبۡدٗا ٩٣﴾ مريم، کە دیارە ئەمە ئیجبارییە، بەڵام عیبادەتی ئیختیاریی ئەوەیە کە ئینسان، یاخود فریشتەکان، یان جندی مسوڵمان پێی هەڵدەستن، ئنجا ئەوپەڕی ملکەچیی، دەبێ ئەوپەڕی بە گەورەگرتن، وە ئەوپەڕی خۆشویستنو ئەوپەڕی لێترسانیشی لەگەڵ دابێ، ئنجا پێی دەگوترێ عیبادەت.

( ٱهۡدِنَا): (هِدايَة) یانی: ڕێ پیشاندانێکی بە لەباریی (الدِلالَةُ بلُطْفٍ)، وە هیدایەت چوار جۆرە:

١- هیدایەتی غەریزەو عەقڵو هەستەکان، کە ئەوە بۆ هەموو کەس هەیە، بەڵکو هیدایەتی هەستەکانو غەریزە لە ژیاندارانیشدا[1] هەیە، خوا ﷻ لە

---

١) وشەی (ژیاندار)م لە جیاتی (گیاندار) بۆ مانای (حیوان) پێ ڕاسترە، چونکە: گیان مانای (روح)ەو، چگە لە مرۆڤیش هیچ زیندەوەرێکی دیکە (روح)ی نیە، بەڵکو تەنیا ژیان (حیاة)یان هەیە دیارە

سووڕەتی (النحل)دا دەفەرموێ: ﴿ وَأَوْحَىٰ رَبُّكَ إِلَى ٱلنَّحْلِ ... ﴿٦٨﴾ ﴾، واتە: وە خوا وەحی نارد بۆ هەنگ، ئەوە مەبەست پێی هیدایەتی غەریزەیە.



٢- هیدایەتی وەحی کە پەیامو بەرنامەی خوایەو بە پێغەمبەراندا دەنێردرێ.

٣- جۆری سێیەم بریتیە لە کار بۆ ڕێکخستنو ئاسانکاریی (توفیق)، وەك لە سووڕەتی (العنكبوت)دا دەفەرموێ: ﴿ وَٱلَّذِينَ جَٰهَدُواْ فِينَا لَنَهْدِيَنَّهُمْ سُبُلَنَاۚ ... ﴿٦٩﴾ ﴾، واتە: وە ئەوانەی لە ڕێی ئێمەدا خۆ ماندوو دەکەنو تێدەکۆشن، ئێمە ڕێیەکانی خۆمانیان پێشان دەدەین، هەروەها فەرموویەتی: ﴿ وَٱلَّذِينَ ٱهْتَدَوْاْ زَادَهُمْ هُدًى ... ﴿١٧﴾ ﴾ محمد، واتە: وە ئەوانەی هیدایەتیان وەرگرتوە، خوا هیدایەتیان بۆ زیاد دەکات.

٤- هیدایەتی چوارەم لە بەهەشتە، وەك خوای بێ هاوتا کە باسی بەهەشتیان دەکات، دەفەرموێ: ﴿ سَيَهْدِيهِمْ وَيُصْلِحُ بَالَهُمْ ﴿٥﴾ ﴾ محمد، توێژەرانی قورئان دەڵێن: بەهەشت بۆخۆی عالەمێکەو لەوێ ئەگەر خوا ئینسان ڕێنمایی نەکاو ڕێی پێشان نەداو بەهۆی فریشتەکانەوە نەیخاتە دڵ، کەس بە شوێنی خۆی نازانێ، بۆیە دەفەرموێ: ﴿ سَيَهْدِيهِمْ وَيُصْلِحُ بَالَهُمْ ﴾ خوا ڕێیان پێشان دەداتو حاڵیان چاك دەکات، واتە: هەرکەس دەچێتە مەقامو مەنزڵی خۆی، وە بۆیەش ئەهلی بەهەشت دەڵێن: ﴿ ... ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِى هَدَىٰنَا لِهَٰذَا وَمَا كُنَّا لِنَهْتَدِىَ لَوْلَآ أَنْ هَدَىٰنَا ٱللَّهُۖ ... ﴿٤٣﴾ ﴾ الأعراف، واتە: ستایش بۆ ئەو خوایەی کە ڕێنمایی کردین بۆ ئێرە، وە ئەگەر خوا ڕێنمایی نەکردباین نەدەگونجا ڕێ بدۆزینەوە. وە هەندێك دەڵێن: مەبەست پێی ڕێ دۆزینەوەو چوونو نیشتەجێبوونە لە قۆناغو مەنزڵی خۆیان لە بەهەشتدا.

---

فریشتەو حند (ملائكة و جن)م مەبەست نینو ئەوان حیسابێکی دیکەی سەربەخیان هەیە.

(ٱلصِّرَٰطَ ): بەمانای ڕێی ڕاست دێت، واتـە: (الطَریـق السَّـهل الْمُـستَقِیم) ڕێیـەك ئاسان پێیدا بڕۆی‌و ڕاستیش بێت. جا وشەی (مُستقیم)یش واتە: ڕاست‌و بێ گرێ‌و گۆڵ. دیـارە هـەر وشـەی (صِراط) بۆخـۆی یـانی: ڕێـی ڕاسـت‌و وشـەی: (مُـستقیم)یشی کراوە بە سیفەت، تـاکو ئەوپـەڕی ڕاسـت‌و ڕێکیـی‌و بـێ گـرێ‌و گۆڵیی بگەیەنێ، هەڵبەت لێرەدا خوا وشەی: (ٱلصِّرَٰطَ ٱلْمُسْتَقِيمَ )ی خواستۆتەوە، بۆ تـەعبیـرکردن لە شەریعەت‌و بەرنامەی خۆی.

(أَنْعَمْتَ عَلَيْهِمْ ): وشەی (نِعمَة) واتە: حاڵەتێکی باش، کەواتە: (أَنْعَمْتَ عَلَيْهِمْ ) واتـە: ئەوانەی حاڵت بـاش کـردوون‌و چاکەت لەگەڵ کـردوون، کـە لایـەنی ماددیی‌و مەعنەویی دەگرێتەوە.

(ٱلضَّآلِّينَ ): واتـە: ڕێـی لـێ ون بـووان، چـونکە: (الـضّلالُ: العُـدُولُ عَـنْ الطَّرِيـقِ الْمُـستَقِيمْ وَيُضَـادُّهُ الـهِدَايَةُ) واتە: (الضّلالُ) بریتیە لە لادان لەڕێی ڕاسـت، وە پێچەوانەکەی هیدایەتە.

## مانای گشتی سووڕەتی فاتیحە[1]

سـەرەتا دەبـێ ئـەوە بـزانین کـە خـوا ﷻ سـووڕەتی فاتیحـەی لەسـەر زمـانی بەنـدەکانی فـەرمووەو شتێکی زۆر تایبەتـەو، لـە حەقیقەتـدا فاتیحـە تەعبیـر لـە ناخی ئێمە دەکات، بابزانین چۆن؟

---

١) سـتایش‌و سـوپاس بـۆ خـوا یەکـەمین بەرهـەمم بریتیـە لـە: (پوختەیـەك دەربـارەی ئیـسلام)، کـە تەفسیری سووڕەتی فاتیحەیـە. بڕوانـە: چاپی دووەم: ٢٠٠٦، نووسینگەی تەفسیر، بۆیـە هـەر کەسێك شەرح‌و ڕوونکردنەوەی زیاتری سووڕەتی (فاتحة)ی دەوێ، دەتوانێ سەرنجی ئەو کتێبە بدات، شایانی باسە کە ئەو کتێبـە لـە زینـدانی ئـەمریکایی یەکانیـشدا نووسیومە، بەناوونیـشانی: (الإسلام كما يتجلـى فـي كتـاب الله ﷻ )و هەشـت بەرگـە، ئـەویش هێڵـە گـشتییەکانی هـەر لەبـەر ڕۆشـنایی سووڕەتی (فاتحة)دا نووسراون.

بەندە کە دەست دەکات بە گفتوگۆو وتوووێژ لەگەڵ خوای پەروەردگاردا، پێش هەموو شتێك چی دێتە دڵو پێویستی بەچی هەیە؟ ﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ﴾،  بەناوی خوای بەبەزەیی‌و بەخشندە، یەکەمین شتێك کە تۆ دەیکەیە دەستپێك ئەوەیە کە دەبێت بەناوی خوا دەستپێبکەی، بەناوی خوا، واتە: ئەم کارە بۆ خوایە، وە بەناوی خوا، واتە: بە حەول‌و قووەتی خوایە، وە بەناوی خوا، واتە: ئەم کارە بەرێی خواداو بەپێی بەرنامەو شەریعەتی خوایە ﷻ، هەروەها وە ئەوەشی لێوەردەگیرێ کە بوونی خوا وەك تاکە بەدیهێنەرو تاکە پەروەردگارو تاکە خاوەن، لە مێشك‌و دڵی خەڵکیدا شتێکی بەڵگە نەویستە، ئەوەتا پێش ئەوەی هیچ قسەیەك بکەن، یەکسەر دەڵێن: ﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ﴾، ئنجا کاتێ ناوی خوا دێ، تایبەتمەندترین سیفەتی خوا بەنیسبەت ئێمەوە بریتیە لە بەزەیی خواو بەخشندەیی خوا، بەزەیی خوا لە دنیاداو، بەخشندەیی‌و کەرەم‌و لێبوردنی خوا لە دوارۆژدا، بۆیەش من وشەی (رحمان)م بە (بەبەزەیی) لێکداوەتەوەو، وشەی (رحیم)یش بە (بەخشندە)، چونکە بەڵێ هەردووکیان بە مانای بەبەزەیی دێن، بەڵام بەزەیی خوای پەروەردگار لە دنیادا هەموو شتێکی گرتۆتەخۆ، وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿... وَرَحْمَتِي وَسِعَتْ كُلَّ ... ﴿١٥٦﴾﴾ الأعراف، بەڵام خوا ﷻ فەرموویەتی لە دوارۆژدا ﴿فَسَأَكْتُبُهَا لِلَّذِينَ يَتَّقُونَ﴾، تایبەتی دەکەم بە ئەهلی تەقواوە: ﴿... وَكَانَ بِالْمُؤْمِنِينَ رَحِيمًا ﴿٤٣﴾﴾ الأحزاب، واتە: خوای پەروەردگار بەرانبەر ئیمانداران لە رۆژی دواییدا خاوەنی بەزەیی یە، بەزەیی خواش بۆ ئیمانداران لە لێبوردن‌و بەخشندەییەکەیدا بەرجەستە دەبێ، جا دوای ئەوەی کە ئینسان ناوی خوای هێناو بەناوی خوای بە بەزەیی‌و بەخشندە دەستی پێکرد، دەڵێ: ﴿الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ﴾، ستایش بۆ خوای پەروەردگاری جیهانەکان، چونکە پاش ناسینی خوا، گەورەترین شتێك کە ئینسان پێویستە پێی هەڵسێ‌و گەورەترین ئەرك ئەوەیە کە ستایشی خوای پەروەردگار بکات، وشەی (حَمْد)یش لەگەڵ وشەی (مَدْح) لێك نزیکن، بەڵام (مَدْح) جاری وا هەیە بۆ شتێ

كـە خـاوەن عـەقڵ‌و ئیــرادەش نیـە بـەكاردێت، بـۆ وێنـە: خـواردن مـەدح دەكـرێ، خانووبەرە مـەدح دەكـرێ، جلو بەرگ مەدح دەكرێ، بـەڵام (حَمْد) تایبەتـە بـە خـاوەن ئیــرادەو شـعوورێك كـە خـاوەنی سیفەتی بـەرزو چـاك بێـت، جیاوازیـشی لەگەڵ سـوپاس (شكر) ئەوەیە، كە (شكر) لە بەرانبەر نیعمەتدایـە، بـەڵام (حَمْد) مـەرج نیـە لـە بەرانبـەری نیعمـەت دابـێ، ئێمـە كـە دەڵـێین: ﴿ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴾، ستایش‌و مـەدح‌و سـەنا بـۆ پـەروەردگاری جیهانـەكان، هەرچـەندە هەموو چاكەیەكی خوای میهرەبان بۆ ئێمە هاتوە، بەڵام تۆ لەو حاڵەتەدا چاكەكانی لەبەرچاو ناگری، واتە: خوای پەروەردگار ئەگەر گریمان هیچ چاكەیەكیشی لەگـەڵ ئێمە نەكردبا، هەر شایستەی ئەوە بوو كە ستایشی بكرێ‌و مەدح بكرێ، جا ئێمە ستایشی خوای پەروەردگار دەكـەین، وە بـە پـەروەردگاری جیهانـەكان دەیناسـێنین ﴿ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴾، پاشان دووبارەی دەكەینەوە ﴿ ٱلرَّحْمَـٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴾، كـە: بـە بـەزەیی‌و بەخـشندەیە. ﴿ مَـٰلِكِ يَوْمِ ٱلدِّينِ ﴾، خـاوەنی ڕۆژی سـزاو پاداشـتە، دوای ئـەوە دەڵـێین: ﴿ إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ ﴾، لێـرەدا تەماشـا دەكـەین، هـەتا ئـەم ئایەتـەی پێنجـەم بەشـێوەی نادیـار (غائـب) قـسە دەكـرێ لـە خزمەتی خوادا، ستایشی خوا دەكرێ‌و نـاوی دەهێنـرێ‌و مـەدح دەكـرێ‌و تەمجید دەكرێ، دوایی یەكسەر لە ئایەتی پێنجەمەوە جۆری قسەكردن دەگۆڕێ بۆ حاڵەتی دواندن (خطاب): ﴿ إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ ﴾، واتە: هەرتۆ دەپەرستین‌و داوای یارمەتییش تەنیا لەتۆ دەكەین، جا ئایا ئەوە یانی چی؟ واتە: ئەی ئەو خوایەی، كە خاوەنی ئەو وەسفانەی تۆ شایستەی ئەوەی كە تەنیا تۆ بەندایـەتییت بـۆ بكرێ‌و بپەرسـترێی، بـە مانـای فراوانـی پەرسـتن، وە بـەبێ تـەنیا داوای یارمـەتی لـەتۆ كـردنیش بەندایـەتیی بـۆ تـۆ نـاكرێ، كەواتـە: ﴿ ٱهْدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلْمُسْتَقِيمَ ﴾، ڕێـی ڕاستمان پێشـاندە، چونكە بەندایەتیی بۆ خوا، پێویستی بەوەیە بە ڕێیەكی ڕاست دابێ، خۆ نابێ هـەر بـە پێخواسی بـەنێو بكـەوی! وەك بڵـێی: دڵـم لەگـەڵ خـوادا

چاکـە! بـەڵکو دەبـێ بـەڕێی خـوادا خـوا بپەرسـتی، بـەڵێ: دەبـێ تـەنیا خـوا بپەرسـترێو تەنیا بەو شێوەیەش کە بۆخۆی فەرمانی پێکردووە بپەرسترێ، جا دیارە ئـەویش پێویـستی بـە ﴿ ٱلصِّرَٰطَ ٱلْمُسْتَقِيمَ ﴾، ڕێـی ڕاسـتە، ڕێـی ڕاسـتی خـوای بـە بەزەییش بریتیە لە کتێبەکەیو سوننەتی پێغەمبـەر ﷺ، ئنجا ئایا ڕێی ڕاستی خوا ﷻ هەر شتێکی تیۆریی (نظري)یەو وەك حەقیقەتێکی موتڵەق هاتوە، یاخود لە واقیعی عالەمیشدا بەرجەستە بووە؟! لە وەڵامـدا دەڵێین: هـەر لـەو کاتـەوە کـە خـوای کاربـەجێ یەکـەمین ئینـسانی خوڵقانـدوە، کـە (ئـادەم)ەو یەکـەمین پێغەمبەریش بووە، هەتاکو پێغەمبەری کۆتایی ﷺ، وە هەتا دنیا بە کۆتا دەگات، کۆمەڵی ئیمانداری ڕێی ڕاستگرتووی خوا پێداو هەر هەبووەو هەر دەبێ، تا کۆتایی دنیـا، بۆیـەش یەکسەر لـەدوای: ﴿ ٱهْدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلْمُسْتَقِيمَ ﴾، دەفـەرموێ: ﴿ صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنْعَمْتَ عَلَيْهِمْ ﴾، ڕێـی ئەوانـەی چاکەت لەگەڵـدا کـردوونو نیعمـەتت لەگـەڵ نواندوون، دیارە وشـەی نیعمەت (نِعْمة) هەموو چاکەیەك دەگرێتەوە، بەڵام لێرەدا مەبەسـت پێـی نیعمـەتی موتڵەقـەو، نیعمـەتی موتڵـەقیش لەڕاسـتیدا بریتیـە لـە هیدایەتو، نیعمەتی بەندایەتیی بۆ خواو، نیعمەتی خوا پەرستیی، ئنجا ئێمە چۆن دەزانین ﴿ ٱلَّذِينَ أَنْعَمْتَ عَلَيْهِمْ ﴾ کێن؟ ئەوە لە سوورەتی (النسـاء) لە ئایەتی (٦٩)دا خوای زاناو توانا ئەوانەمان بۆ پێناسە دەکاتو دەفەرموێ: ﴿ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ فَأُوْلَٰٓئِكَ مَعَ ٱلَّذِينَ أَنْعَمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِم مِّنَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ وَٱلصِّدِّيقِينَ وَٱلشُّهَدَآءِ وَٱلصَّٰلِحِينَ ۚ وَحَسُنَ أُوْلَٰٓئِكَ رَفِيقًا ﴾، واتە: هەرکەسێك گوێڕایەڵیی خواو پێغەمبەر ﷺ بکات ئـەوە ئەوانە لەگەڵ ئەو کەسانە دان کە خوا چاکەی لەگەڵدا کـردوون، لـە پێغەمبـەرانو بڕوا پتەوان (یان ڕاسـتگۆیان)و شەهیدانو چاکان، وە ئەوانەش باشتـرین هـاوەڵن. ئنجا لە کۆتاییدا دەفەرموێ: ﴿ غَيْرِ ٱلْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ ﴾، ڕێی ئەوانـە نـا کە تووڕەیيان هاتۆتە سەر، وە ڕێی سەرلێشێواوانیش نا، جێـی سـەرنج ئەوەیـە کـە

بەنیسبەت نیعمەتەکەوە پاڵی داوەتە لای خوا: ﴿ صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمۡتَ عَلَيۡهِمۡ ﴾، بەڵام بەنیسبەت (غَضَب و ضَلال)ی ئەوانەی کە غەزەبی لێگیراوون و ئەوانەی سەرگەردان بوون، پاڵی داوەتە لای خۆیان و غەزەبەکەی بە (مَبنيّ للمَجْهُول) هێناوە: ﴿ غَيۡرِ ٱلۡمَغۡضُوبِ عَلَيۡهِمۡ ﴾، واتە: ئەوانە نا، کە غەزەبیان لێگیراوە، هەڵبەتە خوای بێ وێنە لێیان تووڕە بووە، بەڵام لە ڕووی ئەدەبەوە پاڵی نەداوەتە لای خوا، چونکە خەتای خۆیانە خوا لێیان تووڕە بووە، شایانی باسیشە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: {(إِنَّ الْمَغْضُوبَ عَلَيْهِمْ الْيَهُودُ وَ الضَّالِّينَ النَّصَارى) (رَوَاهُ أَحْمَد برقم: (١٨٨٩١)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٢٩٥٣) عَنْ عَدِيِّ بْنِ حَاتِمٍ رضي الله عنه}، واتە: (لێتووڕەبووان) مەبەست پێی جوولەکەکانن، وە (گومڕابووان)یش مەبەست پێی نەصرانیی یەکانن، جوولەکەکان هەقیان ناسی، بەڵام شوێنی نەکەوتن، موحەممەدیان ﷺ ناسی بەڵام ئیمانیان پێ نەهێنا: ﴿ ٱلَّذِينَ ءَاتَيۡنَٰهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ يَعۡرِفُونَهُۥ كَمَا يَعۡرِفُونَ أَبۡنَآءَهُمۡ ...﴿١٤٦﴾ ﴾ البقرة، واتە: ئەوانەی کتێبمان پێداون وەك چۆن کوڕەکانی خۆیان دەناسی، ئاوا موحەممەدیشیان دەناسی و دەیانزانی کە پێغەمبەری خوایە، کەچی ئیمانیان پێ نەهێنا، بۆیە خوا غەزەبی لێگرتن، بەڵام نەصرانیی یەکان سەریان لێ تێکچوو موحەممەدیان نەناسی هەڵبەتە زۆربەیان ڕێیان لێ تێکچووو سەرگەردان بوون، بەڵام لە سەرگەردانییەکەیاندا کەمتەرخەم بوون، چونکە دەیانتوانی سەرگەردان نەبن و، ئەگەر گوێیان بگرتایە بۆ هیدایەت لەو گومڕاییە دەهاتنەدەر.

## چەند مەسەلەیەکی گرنگ

<u>**مەسەلەی یەکەم:**</u> سوورەتی فاتیحە بەڕاستی پوختەی مەبەستەکانی قورئانی کۆکردۆتەوەو دەتوانین بڵێین: سوورەتی فاتیحە وەك پێڕستێك وایە بۆ مەبەستەکانی قورئان، وە ئەگەر ئینسان باش سەرنجی بدات، ئەوە زۆر چاك دەبینێ، هەر بۆیەشە خوای بەرزو مەزن ﷻ لەسەر مسوڵمانی پێویست

کردوە، کە لایکەم ڕۆژێ (١٧) جار بیخوێنێ، کە ئەگەر ئینسان هەر نوێژە فەرزەکان بکاتو لە هەر رکاتێکدا فاتیحە بخوێنێ رۆژێ (١٧) جار دەبێ سوورەتی فاتیحە دووبارە بکاتەوە، وە ئەگەر سوننەتەکانیشیان لەگەڵدا بکات، دەچێ بۆ سیو چلیش.



**مەسەلەی دووەم:** سوورەتی فاتیحە ئەگەر ئینسان باش لێی وردبێتەوە، هەست دەکات ئەوەی، کە ئەو پێی خۆشە لە خزمەت خوادا بیڵێو ئەوەی کە دەروونی ئینسان بۆی تینووە، سوورەتی فاتیحە لەخۆی گرتوە، بەڵێ بەڕاستی سوورەتی فاتیحە تەعبیر لە ناخی ئینسانو لە دەروونی ئینسانو لە پێداویستی ئینسان دەکاتو، ئینسان پێویستە لەگەڵ خوادا چۆن هەڵسوکەوت بکاتو چی لێ داوا بکاتو، چۆنی مەدح بکاتو، چی لەگەڵ بڵێ، هەمووی بە چاکترین شێوە گرتۆتە خۆی، وە هەر کەس بە ئەندازەی ئیمانی خۆی، چەندە ئیمانت هەبێتو چەندە تەفاعول بکەی لەگەڵ سوورەتی فاتیحەدا، ئەوەندە لێی بەهرەمەند دەبی، هەیە سوورەتی فاتیحە دەخوێنێو ڕەنگە دوایی بتوانێ بە لاپەڕەیەك تەفسیری بکات، هەشە ڕەنگە بە چەند بەرگی کتێب بۆی تەفسیر نەکرێ، وە ئینسان لەو حاڵەتانەدا کە ئیشراقێکی ڕووحییو حاڵەتێکی ئیمانیی باشی هەیە، لە دڵیدا هەست دەکا کە سوورەتی فاتیحە مانای زۆر فراوانی هەیە، ئاگاداریشن کە بەندە یەکەم بەرهەمی کتێبی: (پوختەیەك دەربارەی ئیسلام) بووە، کە کتێبێکی (٣٠٠ - ٤٠٠) لاپەڕەییە لەبەر تیشکی سوورەتی فاتیحەدا نووسیومە، وە ئەو کتێبەش کە لە (زیندانی ئەمریکا)دا نووسیومە: (الإسلام كما يتجلّى في كتاب الله) ئەویش، کە چەند هەزار لاپەڕە زیاترە، بە گشتیی لەژێر ڕۆشنایی سوورەتی فاتیحەدا نووسراوە.

**مەسەلەی سێیەم:** لە کۆتایی تەفسیری سوورەتی فاتیحەدا ئەم فەرمایشتەتان بۆ دەخوێنمەوە: {(عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: بَيْنَمَا رَسُولُ اللهِ ﷺ وَعِنْدَهُ جِبْرِيلُ عليه السلام إِذْ سَمِعَ نَقِيضاً فَوْقَهُ، فَرَفَعَ جِبْرِيلُ عليه السلام بَصَرَهُ إِلَى السَّمَاءِ، فَقَالَ:

هَذَا بَابٌ قَدْ فُتِحَ مِنَ السَّمَاءِ مَا فُتِحَ قَط، قَالَ: فَنَزَلَ مِنْهُ مَلَك فَأَتَى النَّبِيَّ ﷺ فَقَالَ: أَبْشِرْ بِنُورَيْنِ أُوتِيتَهُمَا لَمْ يُؤْتَهُمَا نَبِيٌّ قَبْلَكَ فَاتِحَةِ الكِتَابِ، وَخوَاتِمِ سُورَةِ البَقرَةِ، لَمْ تَقْرَأْ حَرْفًا مِنْهُمَا إلاَّ أُعْطِيتَهُ) (رَوَاهُ مُسْلِم برقم: (١٨٧٤)، وَالنَّسَائِيُّ برقم: (٩١١)، وَللَّفْظُ للنَّسَائِي}، واته: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس دەڵێ: لەکاتێکدا جیبریل ؑ لای پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەنگێکی لە سەروویەوە بیست، جیبریل ؑ چاوی بەرەو سەرێ هەڵبڕی گوتی: ئەوە دەرگایەکە لە ئاسمانێ کرایەوە، کە هەرگیز نەکراوەتەوە، گوتی: وە فریشتەیەك لێیەوە دابەزی هاتە لای پێغەمبەر ﷺ گوتی: موژدەت لێبێ بە دوو ڕۆشنایی، کە پێتدراون‌و پێش تۆ بە هیچ پێغەمبەرێك نەدراون، دەستپێکی کتێب (فاتیحە)و کۆتاییەکانی بەقەرە، هیچ پیتێکیان ناخوێنی مەگەر ئەوەی داوای دەکەی پێت دەدرێ.

خوا لەو کەسانەمان بگێڕێ، کە هەر کات سووڕەتی فاتیحەمان خوێند ئەوەی تێدا داوا کراوە، خوا پێمان ببەخشێ. ئامین .

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی سێیەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

بەڕێزان ! خوا پشتیوان بێ لەم دەرسەوە دەست دەكەین بە تەفسیركردنی سوورەتی (البقرة)و لەم دەرسەدا پێنج ئایەتی یەكەمی سەرەتای (البقرة) تەفسیر دەكەین، بەڵام پێش ئەوە، بۆ ئەوەی بەرچاومان ڕوون بێ، دەربارەی سوورەتی (البقرة) بەگشتی، كە چ سوورەتێكەو چ پلەو پایەیەكی هەیەو چەند ئایەتە؟ وە نێوەرۆكی بابەتەكانیو هێڵە گشتییەكانی چۆنن؟ لە دوو توێی وەڵامی ئەم پرسیارانەدا هەوڵدەدەین بەگوشراوییو پوختیی بە یارمەتی خوای بەخشەر تیشك بخەینە سەر ئەم سوورەتە مەزنەی قورئانو دەڵێین :

سوورەتی بەقەرە سوورەتێكی مەدەنییە، واتە: لەو سوورەتانەیە كە لە مەدینە هاتوونە خوار، بەڵكو لە سەرەتای نیشتەجێبوونی پێغەمبەری خوا ﷺ لە شاری (مەدینە)دا هاتۆتە خوار، ژمارەی ئایەتەكانی (٢٨٦) ئایەتە، وە گەورەترینو درێژترین سوورەتی قورئانە، وە گەورەترین ئایەتی تێدایە، كە بریتیە لە (آية الكُرسي) وەك لە: (صحيح مسلم)دا هاتوە، وەك دواتر لەكاتی خۆیدا باسی دەكەین، هەروەها درێژترین ئایەتی قورئان لە سوورەتی بەقەرەدا هاتوە، كە ئایەتی (٢٨٢)ی (الدَّينَ)ە، وە سوورەتی بەقەرە پێگەو پایەكی تایبەتی هەیە لەنێو سوورەتەكانی قورئاندا، وەك لەم فەرمایشتانەی پێغەمبەرەوە ﷺ دەردەكەوێ، وە پێش ئەوەش بە سەرنجدانی سوورەتی بەقەرەو ئایەتەكانی بۆمان دەردەكەوێ، كە بەڕاستی گەورەترینو گرنگترین سوورەتی قورئانە، لەو ڕووەوە كە زۆرترین یاساكانی شەرعییو، زۆرترین ڕاستییەكانی دینی گرتوونە خۆی، پێغەمبەر ﷺ لە فەرمایشتێكدا فەرموویەتی: {(لاَ تجعَلُوا بُيُوتَكُمْ مَقَابِرَ، فَإِنَّ البَيْتَ الَّذي تُقْرَأُ فِيهِ سُورَةَ البَقَرَةِ لاَ يَدخُلهُ الشَّيطَانُ) (رَوَاهُ أحمد برقم: (٨٩٠١)، ومُسلم برقم:

(١٨٢١)، وَالتِّرمِذِيُّ بـرقم: (٢٨٧٧)، عَـن أبـي هُرَيـرَة رضي الله عنه}، واتـە: ماڵـەکانی خۆتـان مەکەن بە گۆڕستان، چونکە ئەو ماڵەی کە سوورەتی بەقەرەی تێدا دەخوێنـدرێ شەیتانی ناچێتە نێو (شەیتان لێی ناچێتە ژوور).

لە فەرمایشتێکی دیکەشدا کە (إبـن حِبّـان) لـە (سَهل بـنِ سَعد)ەوە خـوا لێیـان ڕازی بێ دەیگێڕێتەوە، فەرموویەتی: ((إِنَّ لِكُلِّ شَيءٍ سِنَاماً وإِنَّ سِنَامَ القُرآنِ سُورَةَ البَقَرَةِ، مَنْ قَرَأَهَا فِي بَيتِهِ لَيلاً لَمْ يَدخُل الشَّيطانُ بَيْتَهُ ثَلاثَ لَيالٍ وَ مَنْ قَرَأَهَا نَهَاراً لَمْ يَدخُل الشَّيطَان بَيْتَهُ ثَلاثَةَ أيَّامٍ)) {رَوَاهُ ابْـنُ حِبَّـانَ بـرقم: (٧٨٠)، وَضَعَّفَهُ الأَلباني في (السلسلة الضعيفة) برقم: (١٣٤٩)}، واتـە: هەموو شتێك لووتکەی هەیە، لووتکەی (چڵە پۆپەی) قورئانیش سوورەتی (البقـرة)یـە، وە هەرکەسێك شەوێ بیخوێنێ، تا سێ شەوان شەیتان ناچێتە ماڵیان، وە ئەگەر بە ڕۆژ بیخوێنێ، هەتا سێ ڕۆژان شەیتان ناچێتە ماڵیان.

لـە فەرمایشتێکی دیکەدا کـە موسلیم لـە ئـەبی ئومامـەوە خـوا لێـی ڕازی بـێ دەیگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((إقرَأُوا القُرآنَ، فَإِنَّهُ يَأتي يَوْمَ القِيَامَةِ شَفِيعاً لأَصحَابِهِ، إقرَأُوا الزَّهْرَاوَينِ: البَقَرَةَ وسُورةَ آلِ عِمرَانَ، فَإِنَّهُمَا تَأتِيَانِ يَوْمَ القِيَامَةِ كَأَنهُمَا غَمَامَتَانِ أو غيَايَتَانِ، أو كَأَنَّهُمَا فِرقَانِ مِن طَيْرٍ صَوَافٍّ، تُحاجَّانِ عَنْ صَاحِبِهِمَا، إقرأُوا سُورَةَ البَقَرَةِ، فَإِنَّ أخْذَهَا بَرَكَةٌ، وتَرْكَهَا حَسْرَةٌ، وَلا تَسْتَطِيعُهَا البَطَلَةُ)) (رَوَاهُ مُسْلِمٌ برقم: (١٨٧١)، عَن أبي أُمَامَةَ رضي الله عنه)، واتـە: قورئان بخوێنن، چونکە قورئان لە ڕۆژی دواییدا دێت شەفاعەت دەکات بۆ ئەوانەی کە هەڵگری قورئان بوون ، وە دووچرایەکان {(زهراوين) واتە: دووچرای تیشکدەر، دوو ڕۆشنەکان} بخوێننەوە سوورەتی (البقرة، آل عمران)، چونکە لە ڕۆژی دواییدا دێـن وەك دوو هـەور سـێبەر دەکـەن لـە خاوەنەکـەیان، یـاخود وەك دوو سـەقفەو سەربان، یان وەك دوو پۆلی باڵندە کە دێن بەڕیز، باڵیان ڕادەگرن، ئاوا دێـن سـێبەر لە خاوەنەکانیان دەکەن، وە بـەرگریی دەکـەن لـە خاوەنـەکانیان، سوورەتی بەقـەرە بخـوێنن، چـونکە سـوورەتی بەقـەرە وەرگـرتنی (و لەبـەرکردنی و تێگەیـشتنی) بەرەکەتـە، وە ئیهمـالکردنی و وازلێهێنـانی مایـەی حەسـرەتو پەشـێمانییە، وە

جادووگەران، هەرکەسێك سووڕەتی بەقەرەی پێبێ، ناتوانن کاریگەرییان لەسەر هەبێ. ئەوە مانایەکەیەتی، مانایەکی دیکەی ئەوەیە کە: ئینسانی جادووگەر ناتوانێ سووڕەتی بەقەرە لەبەربکات، وە ئەوە شتێکی جەرِبێنراو (مُجَرَّب)ە کە ئەوانەی کە (جن)یان دەچێتە نێو بەدەن، یان ئەوانەی کە سیحریان لێ دەکرێ، سووڕەتی بەقەرە کاریگەریی هەیە بۆ هەڵوەشاندنەوەی سیحرەکەو بۆ دەرکردنی (جن) لە جەستەیان.

ئێستاش با تیشکێك بخەینە سەر باس‌و بابەتەکانی سووڕەتی (البقرة):

## نەخشەی بابەتەکانی سووڕەتی بەقەرە بەگشتی

* لە ئایەتی (١) تا (٢٠)، خوا ﷻ پێناسەی ئەوانە دەکات، کە کۆمەڵگای ئیسلامییان لێ پێکدێت، کە :

١) پارێزکاران‌و ئیمانداران‌و، پێنج ئایەتی بۆ تەرخان کردووون لە سەرەتای سووڕەتەکە، وەك دوایی باسی دەکەین.

٢) کافرانن، کە دوو ئایەتی بۆ تەرخان کردووون.

٣) وە دووڕووەکانن (المنافقون)، کە لە سێزدە ئایەتدا خوا باسیان دەکات، ئنجا (٢١) تا (٢٩)، خوای زانا بانگی مرۆڤایەتی دەکات بۆ تەقواو بۆ ئیمان هێنان بە پێغەمبەر ﷺ، وە باسی پێکهاتەی ئاگری دۆزەخ دەکات، پاشان باسی پاداشتی بەهەشت دەکات، چەند قسەیەکی دیکە لەگەڵ مرۆڤایەتی دەکات بەگشتی.

* لە ئایەتی (٣٠) تا (٣٩)، واتە لە دە (١٠) ئایەتدا خوای کاربەجێ باسی بەسەرهاتی ئادەم دەکات.

* ئنجا لە ئایەتی (٤٠) تا (١٢٣)، واتە هەشتاو چوار ئایەت تەرخان کراوە بۆ باسی وەچەی ئیسرائیل بەتایبەت‌و ئەهلی کیتاب بەگشتی، ئەزموونیان، هەڵەکانیان، هەڵوێستەکانیان، تاکو بۆ ئۆممەتی پێغەمبەر ﷺ ببنە سەرمەشق لە شتە چاکەکانیاندا، وە ببنە جێی پەند وەرگرتن، لە هەڵەو

کەمو کوورپیەکانیان.

- وە لە ئایەتی (١٢٤) تا (١٤١)، باسی بەسەرهاتی ئیبڕاهیمو ئیسماعیلی کوڕیەتی (علیهما الصلاة والسلام).
- وە لە ئایەتی (١٤٢) تا (٢٤٢)، واتە سەدو یەك ئایەت (١٠١) تەرخانکراوە بۆ کۆمەڵێك یاسای نێو کۆمەڵگاو دەوڵەتی ئیسلامیی، هەر لە باسی ڕووگە (قِبلَة) وە، بگرە، هەتا باسی صەفاو مەروە، پاشان ڕۆژووگرتنو، وەسیەتکردنو، جەنگوجیهادو، حەجو عومرەو، مەیخۆریی‌و قومارو، سوێندخواردنو، نیکاح و تەلاق و ... هتد.
- وە لە ئایەتی (٢٤٣) تا (٢٥٣)، واتە یازدە ئایەت تەرخان کراوە بۆ باسی بەرەنگاربوونەوەو ڕووبەڕووبونەوە، وە باسی بەسەرهاتی طالووتو جالووت دەکرێ.
- وە لە ئایەتی (٢٥٤) تا (٢٨٣)، کۆمەڵێك یاسای ئابووریی (إقتصاد) باس دەکرێن، بە تایبەت باسی سوود (رِبَا) کە حەرامو قەدەغەیە، وە باسی کڕینو فرۆشتن، کە حەلاڵەو باسی قەرز پێدان و نووسینی قەرزو ڕەهن دەکرێ.
- وە سێ (٣) ئایەتی کۆتایی، کە بە خەواتیمی سوورەتی بەقەرە ناودارنو لە فەرمایشتێکی پێشتردا باسمان کردن، کە لە (صحیح مسلم)دا هاتوە، وە لەگەڵ سوورەتی (فاتیحە)دا گرنگیی‌و پێگەیەکی تایبەتییان هەیە.

ئەمە نەخشەی باسو بابەتەکانی سوورەتەکانی بەقەرە بوو بەگشتیو ئێستاش کاتی ئەوەیە، کە دەست بە توێژینەوەو ڕوونکردنەوەی ئایەتەکان بکەین:

﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ ۞ الٓمٓ ﴿١﴾ ذَٰلِكَ ٱلْكِتَٰبُ لَا رَيْبَ ۛ فِيهِ ۛ هُدًى لِّلْمُتَّقِينَ ﴿٢﴾ ٱلَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِٱلْغَيْبِ وَيُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَمِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ يُنفِقُونَ ﴿٣﴾ وَٱلَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ وَمَآ أُنزِلَ مِن قَبْلِكَ وَبِٱلْءَاخِرَةِ هُمْ يُوقِنُونَ ﴿٤﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ عَلَىٰ هُدًى مِّن رَّبِّهِمْ ۖ وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴿٥﴾﴾

## مانای وشە بە وشەی ئایەتەکان

((بەناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە ۞ ئەلیف، لام، میم ﴿١﴾ ئەو کتێبە هیچ گومانی تێدانیە، ڕێنمایی کەرە بۆ پارێزکاران ﴿٢﴾ ئەوانەی بڕوایان بە نادیار هەیەو نوێژ بەرپا دەکەن، وە لەوەی پێمان داون دەبەخشن ﴿٣﴾ وە ئەوانەی بڕوایان دێنن بەوەی، کە بۆلای تۆ نێرراوەتە خوار، وە بەوەی کە لە پێش تۆدا نێرراوەتە خوار، وە بڕوای پتەویان بەڕۆژی دوایی هەیە ﴿٤﴾ ئا ئەوانە لەسەر ڕێنمایی یەکن لە پەروەردگاریانەوە، وە هەر ئەوانە سەر فرازن ﴿٥﴾)).

## شیکردنەوەی هەندێك لە وشەکان

(رَيْبَ): بەمانای گومان هاتوە (الرَّيبُ: الشَّكَ وَعَدَمُ الطُّمأْنيَة) زەمەخشەری، دەڵێ: (الرَّيبُ: مَصْدَر رابَ إذا أحدَثَ لَهُ الرِّيبَة) واتە: وشەی (رَيبْ) چاوگی (رابَ)یە، واتە: خستیە گومانەوە، یاخود خستیە دوو دڵییەوە، وە لە پێناسەی (رَيب)دا گوتراوە: (هُوَ قَلَقُ النَّفسِ وَ اضطِرَابُها) واتە: دڵەڕاوکەو دڵ لە دڵ دان، یانی: پێچەوانەی دڵنیایی‌و دڵ دامەزراوییە.

(هُدًى): پێشتر هەندێکمان شیکردەوە، ئێستاش دەڵێین: هیدایەت سێ جۆرە، چونکە پێشتر کە گوتمان چوار جۆرە، هیدایەتی دوارۆژیشمان حیساب کردبوو.
١ـ هیدایەتی تەکوینیی. ٢ـ هیدایەتی شەرعیی. ٣ـ هیدایەتی تەوفیقیی.

١) هیدایەتی هێنانەدی (الهداية التكوينية)ی: ئەوەیە کە خوا ﷻ هەر شتێکی دروست کردوە ڕێنمایشی کردوە، چۆن بەڕێوەبچێ، وەك لە سووڕەتی (طه) لەسەر زمانی مووسا عليه السلام و لە وەڵامی فیرعەوندا، فەرموویەتی: ﴿ رَبُّنَا ٱلَّذِىٓ أَعْطَىٰ كُلَّ شَىْءٍ خَلْقَهُۥ ثُمَّ هَدَىٰ ﴿٥٠﴾ ﴾، واتە: پەروەردگارمان ئەو کەسەیە بوونی

بە هەموو شتێك بەخشیوە، پاشان ڕێنماییشی کردوە، ئەمە جۆری یەکەمی هیدایەتەو، ئەم هیدایەتەی خوای کاربەجێ، گشتگیرە بۆ هەموو شتێك‌و هیچ شتێك نیە خوا هیدایەتی نەدابێ .

بەڵێ خوا هەرچی دروستی کردوە، ڕێ‌و شوێنی بەڕێوەچوونی بۆ داناوە، هەر لە گەردیلە هەتا کەهکەشان.

٢) هیدایەتی یاسا بۆدانان (الهدایة التشریعیة)ی: ئەویش ئەوەیە، کە خوا بە پێغەمبەراندا (علیهم الصلاة والسلام) بەرنامەکانی خۆی ناردوون، وە خەڵکی پێ هیدایەت داون، ئەوانەی کە دەبێ بە ئیختیاری خۆیان، لەو بەشەدا کە دەکەوێتە ژێر ئیرادەی خۆیانەوە بەو شێوە بژین، کە خوا دەیەوێ، کە دیارەش ئەوەش پێویستی بە هیدایەتی تەشریعی دەکات، ئەوانیش ئینسان‌و جینن.

٣) هیدایەتی یارمەتیدان (الهدایة التوفیقیة): ئەویش ئەوەیە، کە ئینسان دوای ئەوەی شەریعەتی خوا وەردەگرێ‌و لە هیدایەتی تەشریعی خوا بەهرەمەند دەبێ‌و پێیەوە پابەند دەبێ، خوا هیدایەتێکی تایبەتی دیکەی دەدات‌و، کاری بۆ ئاسان دەکات‌و، زیاتر دڵی ڕۆشن دەکاتەوەو ئیمانی زیاد دەکات، وەك لە سوورەتی (الأنفال)دا دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِن تَتَّقُواْ ٱللَّهَ يَجْعَل لَّكُمْ فُرْقَانًا ...﴿٢٩﴾ ﴾، واتە: ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە، ئەگەر پارێزکاریی لە خوا بکەن، فورقانتان پێدەخشێ، واتە دڵتان وا لێ دەکات هەق‌و ناهەق لێك جیابکەنەوە. یان وەك لە سوورەتی (محمد)دا دەفەرموێ: ﴿ وَٱلَّذِينَ ٱهْتَدَوْاْ زَادَهُمْ هُدًى وَءَاتَىٰهُمْ تَقْوَىٰهُمْ ﴿١٧﴾ ﴾، واتە: وە ئەوانەی هیدایەتیان وەرگرتوە، خوا هیدایەتیان بۆ زیاد دەکات، وە تەقواشیان پێدەبەخشێت، وە وەك لە سوورەتی (العنكبوت)دا دەفەرموێ: ﴿ وَٱلَّذِينَ جَٰهَدُواْ فِينَا لَنَهْدِيَنَّهُمْ سُبُلَنَا ۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَمَعَ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٦٩﴾ ﴾، واتە: وە ئەوانەی لەڕێی ئێمەدا تێدەکۆشن، ئێمە

ڕێبازەکانی خۆمانیان پێشان دەدەین، وە بێگومان خوا لەگەڵ چاکەکاران دایە، (واتە شێوازەکانی کارو ڕەفتارو بەندایەتیی و دیندارییان پێشان دەدەین و، بۆیان ڕۆشن دەکەینەوە).

(لِلْمُتَّقِينَ): کۆی (الـمُتَّقِي)یە، و (الـمُتَّقي)یش واتە: پارێزکار، (تَقوَى)ش ئاوا پێناسە کراوە: (التَّقوَى: جَعْلُ النَّفس فِي وِقَايَة مِمَّا يُخَاف) واتە: (تَقوَى) بریتیە لەوەی کە تۆ نەفسی خۆت لە هەرشتێك پارێزکاریی لێبکەی کە جێگای مەترسییە، جا ئایا چ شتێك جێگای مەترسییە؟ بێگومان ئەوە کە ئینسان خوای لێ توورەبێ و لێی ناڕازی بێ و سزای بدات، ئنجا ئایا مرۆڤ بەچی خۆی دەپارێزێ لە تووڕەیی خوا؟ دیارە بەوە کە ئەوەی خوا فەرمانی پێکردوە بەپێی توانا بیکات، وە ئەوەی کە خوا قەدەغەی کردوە بەپێی توانا خۆی لێ دوور بخاتەوە، بۆیە (راغب الأصفهاني) دەڵێ: (وَصَارَ التَّقوَى فِي اصطِلاَحِ الشَّرْعِ: حِفْظُ النَّفسِ عَمَّا يُؤْثِمُ) واتە: وە (تَقوَى) لە زاراوی شەرعدا بریتیە لە خۆپاراستن لە هەر شتێکی گوناهبارکەر، هەڵبەتە ئینسانیش بەدوو شت گوناهبار دەبێت: یەکەم: واجبەکانی خوا بچووێنێ، دووەم: قەدەغەکانی خوا بشکێنێ.

(بِٱلْغَيْبِ): (الغَيْبُ: كُلُّ مَا لايَقَعُ تَحْتَ الحَوَاس) واتە: (غَيْب) بریتیە لە هەر شتێ کە هەستەکان ڕاستەوخۆ پەی پێ نەبەن.

(وَيُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ): واتە نوێژ بەرپا دەکەن، ئیقامەی شتێك: بریتیە لەوەی کە بەردەوام بێت لەسەر کردنی، وە بەو شێوەیە بیکات کە شەریعەت دیاریی کردوە.

(ٱلصَّلَوٰةَ): لە ئەسڵی زمانی عارەبیدا بە واتای دووعاو پاڕانەوە دێت، بەڵام وەك زاراوەی شەرعیی بەمانای ئەو عیبادەتە تایبەتە دێت، کە بە (الله أكبر) دەست پێ دەکات و، بە سەلامدانەوە کۆتایی دێت.

(رَزَقْنَهُمْ ): واتە: پێمان داون، شایانی باسیشە وشەی (رِزْق) لە زمانی عەرەبیدا وە لە بەکارهێنانی قورئاندا، بەس بریتی نیە لەوەی کە ئینسان دەیخوات، بەڵکو هەر شتێك کە ئینسان لێی بەهرەمەند بێت، پێی دەگوترێ (رِزْق)، دەگوترێ: (رَزَقَهُم اللهُ عِلماً) واتە خوای پەروەردگار زانستی پێداون، وە دەگوترێ: (رَزَقَهُ الله مَالاً) خوا سامانو ماڵی پێداوە، کەواتە (رِزْق) لە بەکارهێنانی قورئاندا واتە: هەر شتێك کە خوا بە ئینسانی داوە، چ ماددیی بێ، چ مەعنەویی.

(يُنفِقُونَ ): (نَفَقَ يَعني: مَضَى وَ نَفِذَ) واتە: تەواو بوو، (أَنْفَقَ) واتە: سەرفی کردو خەرجی کرد، لێرەدا مەبەست لە ڕستەی: ﴿ وَمِمَّا رَزَقْنَهُمْ يُنفِقُونَ ﴾، یانی: لە هەرچی پێمان داون، خستوومانەتە بەردەستیان، لێی بەکاردێنن لە پێناوی ڕەزامەندیی خوادا، کە وەك گوتمان: مەفهوومەکەی زۆر فراوانەو تەنیا خواردن بەخشینو پارە بەخشین ناگەیەنێ.

(يُوقِنُونَ ): (يُقَالُ: يَقَنَ المَاءُ: أي رَكَدَ) یانی: ئاوە کە وەستا، وە (یقین) بریتیە لە زانینێك کە ئینسان دڵ لەدڵ دانی تێدا نەمابێ، واتە: زانینێك کە مرۆڤ تەواو دڵی لەسەر چەسپابێو بەرچاوی تێدا ڕۆشن بووبێتەوە.

(ٱلْمُفْلِحُونَ ): لە (فَلْح)ەوە هاتوە (الفَلْحُ الشَقُّ) واتە: لەت کردنو شەق کردن، بۆیە عەرەب دەڵێن: (لا يُفَلِّحُ الحَديدَ إلا الحَدِيدُ) یان دەڵێن: (الحَدِيدُ بِالحَديدِ يُفَلَّحُ) واتە: ئاسن بە ئاسن لەت دەکرێ، وە جوتیار بۆیە پێی دەگوترێ: (فَلاّح) چونکە زەوی دەکێڵێتو لەتی دەکات، (مُفْلِح)یش کەسێکە کۆسپەکانی بەردەمی خۆی دەبڕێ، تا دەگاتە ئەو ئامانجەی کە دەیەوێ، وە (مُفْلِح) لە زاراوەی شەرعدا، واتە: کەسێکە کە لە دنیادا بەختەوەر بووبێ، وە لە دوارۆژیشدا سەرفراز بووبێ، بەهۆی پابەندبوونی بە شەریعەتەوە.

## مانای گشتی ئایەتەكان

﴿ بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ ﴾: بە ناوی خوای بەبەزەیی و بەخشندە. ﴿ الم ﴾: ئەلیف، لام، میم، سێ پیتن، پیتی (أ)، پیتی (ل)، پیتی (م). توێژەرەوانی قورئان زۆر قسەیان كردوە دەربارەی ئەو پیتە پچڕپچڕانە: (الحُرُوف المُقَطَّعَة)، بەڵام باشترین ڕا كە زۆربەیان لەسەری یەك دەنگن، هەر لە (طبري)یەوە تا دوایی، ڕەحمەتی خوایان لێبێ، ئەوەیە كە ﷻ بەهۆی هێنانەوەی ئەم پیتانەوە، دەیەوێ بە خەڵكی بفەرموێ، بەتایبەت بە كافرەكان: كە ئەو قورئانەی موحەممەد ﷺ كردوویەتە بەڵگەی پێغەمبەرایەتی خۆی، وە موعجیزەو نیشانەی موحەممەدە ﷺ، وە كەس نەیتوانیوەو ناتوانێ سوورەتێك وەك یەكێك لە سوورەتەكانی بێنێ، ئەو قورئانە هەر لەو پیتانەو لەو دەنگانە پێكدێ، كە ئێوە قسەیان پێ دەكەن و پێیان دەنووسن، وەك: (أ، ل، م، ن، ق، ص، ... هتد)، دەی ئەگەر ڕاستە موحەممەد ﷺ بۆ خۆی دەستی لە قورئاندا هەیە، خۆ ئێوەش وەك ئەو بەشەرن، فەرموون ئێوەش قورئانێك بێنن، بەڵام ئەگەر نەتانتوانی، بزانن كە ئەوە خوایە سوورەتەكانی ئەو قورئانەو ئایەتەكانی لەو پیتانە پێكهێناوەو بەشەر نیە، نە موحەممەد ﷺ بۆ خۆیەتی وە نەغەیری موحەممەدیشە! بەڵگەش لەسەر ئەم جۆرە لێكدانەوە ئەوەیە كە هەر كاتێ خوای بەخشەر ئەو پیتانەی فەرمووە، یەكسەر باسی قورئانی كردوە، بۆ وێنە: ﴿ الم ۝١ ذَٰلِكَ الْكِتَابُ لَا رَيْبَ ۛ فِيهِ ۛ هُدًى لِّلْمُتَّقِينَ ۝٢ ﴾ البقرة، ﴿ ص ۚ وَالْقُرْآنِ ذِي الذِّكْرِ ۝١ ﴾ ص، ﴿ ق ۚ وَالْقُرْآنِ الْمَجِيدِ ۝١ ﴾ ق، ﴿ يس ۝١ وَالْقُرْآنِ الْحَكِيمِ ۝٢ ﴾ یس، ... هتد هەركات باسی ئەو پیتانە كرابێ، یەكسەر باسی قورئان كراوە، جگە لە چەند شوێنێكی كەم، ئنجا ڕستەی: ﴿ ذَٰلِكَ الْكِتَابُ لَا رَيْبَ ۛ فِيهِ ﴾، ئەو كتێبە گومانی تێدا نیە، واتە: هیچ شتێكی تێدا نیە قابیلی گومان لێكردن بێ و، گومانی تێدانیە كە ئەو سەرچاوەیەی لێوەی هاتوە، خوایە (جَلّ شأنُهُ) ﴿ هُدًى لِّلْمُتَّقِينَ ﴾، ڕێنمایی یە بۆ پارێزكاران، ڕێنمایی یان دەكات

بۆچی؟ بۆ هەموو شتێك كە ئینسـان پێویسـتی پێیەتی لە ژیانی دنیایدا، كە ببێتە مایەی پارێززانی لە تووڕەیی خوا، لە لێپرسینەوەی خوا، لە سزاو جەزرەبـەی خـوا، ئەو قورئانە ڕێنمایی مرۆڤ دەكا، لە ژیانی تاكییدا، لە ژیانی خێزانییـدا، لـە ژیـانی كۆمەڵایەتییدا، لـە ژیـانی سیاسـییدا، ئـەو كتێبـە گومـانی تێدانیـە ڕێنماییكـەرە بـۆ پارێزكاران، بەڵام ئایا پارێزكـاران كێن؟ پێناسـەیان دەكات بە پێنج سـیفەت:

١ – ﴿ ٱلَّذِينَ يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡغَيۡبِ ﴾، ئەوانەی كـە بـڕوا دێـنن بـە نادیـار (پـەنهان) خـوا ﷻ پەنهانە، فریشـتەكان پەنهانن، ڕۆژی دوایی پەنهانە، ڕووح پەنهانـە، هـەموو ئـەو شتانەی كە غەیبن‌و پەنهانن، ئیمانیـان پـێ دێـنن، بۆچـی؟! لەبەرئـەوەی عەقـڵ دەلالەتیان لەسەر دەكات، وە لەبەرئەوەی پێغەمبەری ڕاسـتگۆ ﷺ هـەواڵیان پـێ دەداتو، ئەوانیش بە بەڵگەی عەقڵیی تێگەیشتوون‌و دڵنیابوون كە موحەممـەد ﷺ پێغەمبەرەو ڕاسـتگۆیە، ئەویش هەواڵ بەو شتە نادیارانە دەدات، بۆ ئـەوەی بـڕواداران ئیمانیـان پـێ بێـنن، بەڵـێ یەكـەمین سـیفەتی ئیمانـدارانی پارێزكـار ئەوەیە كە ئیمان بە غەیب دێنن، لەبەرئەوەی پێغەمبەر ﷺ هەواڵی پێدەداتو عەقڵی ساغیش دەلالەتی لەسەر دەكات.

٢ – ﴿ وَيُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ ﴾، نوێژ بەرپا دەكەن بـۆ پەیوەنـدیی بەسـتن لەگـەڵ ئـەو زاتـە نادیارەدا كە خوای پەروەردگارە، وەك پێشـتریش گوتم: بەرپاكردنی نوێژ (إقامـة الصلاة) جیایە لە: بەجێهێنانی نوێژ (أداء الصـلاة)، چونكە نوێژ بەرپا دەكەن، واتە: بەو شێوەیە نوێژەكەیان دەكەن، كە خوا ﷻ فەرموویـەتی، وە لەسەریـشی بەردەوامن، وە هەموو پایە دەریی‌و دەروونیەكانی تێدا جێبەجێ دەكەن.

٣ – ﴿ وَمِمَّا رَزَقۡنَٰهُمۡ يُنفِقُونَ ﴾، واتـە: هـەر ئەوەنیـە كـە هـەقی خـوا جێبـەجێ بكـەن، بەڵكو هەقی خەڵكیش جێبەجێ دەكـەن، لـەوەی كـە پێمـان داون لـە: سـەروەت‌و سامان‌و، خواردن‌و خواردنەوەو، شـارەزایی‌و زانیـاری‌و، عـەقڵ‌و حیكمـەت، جـاهو توانا، لە هەرچی پێمان داون، دەبەخشن‌و بەكاری دێنن لە خزمەت خەڵكدا.

٤ – ﴿ وَٱلَّذِينَ يُؤۡمِنُونَ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيۡكَ وَمَآ أُنزِلَ مِن قَبۡلِكَ ﴾، وە ئەوانەی كە ئیمان دێنن بەوەی كـە بـۆ تـۆ نێردراوەتـە خـوار، (كـە قورئانـە، وە سـوننەتی پێغەمبەریـشە ﷺ،

چونکە ئەویش لە ڕێگای وەحییەوە بۆ پێغەمبەر ﷺ هاتوە)، وە ئیمان دێنن بەوەی کە بۆ ئەوانەی پێش تۆش نێردراوە، واتە: بە کتێبە ئاسمانییەکان، کەواتە: مسوڵمانان هەر لە سەرەتاوە خۆشڕەفتار (متسامح)و کراوەن، ئەوەتا هەر لە سەرەتاوە، ئیسلام فێریان دەکات کە بڕوا بێنن بە هەموو کتێبە ئاسمانییەکان، هەڵبەتە ئەسڵەکەیان نەك ئەو کتێبانەی ئێستا لەبەردەستیان دان، کە بێگومان دەستکاریی کراون و گۆڕدراون.

٥- ﴿ وَبِالْآخِرَةِ هُمْ يُوقِنُونَ ﴾، وە ئەوانە یەقین و دڵ دامەزراوییان هەیە بەرانبەر بە دوارۆژ، ﴿ أُولَٰئِكَ عَلَىٰ هُدًى مِّن رَّبِّهِمْ ﴾، ئا ئەوانە لەسەر هیدایەتێکن لەلایەن پەروەردگاریانەوە، واتە: هیدایەت بۆ ئەوان وەك ولاخێکی ڕێك و پێکە کە سواری بوون و پێی دەگەنە مەنزڵ ﴿ وَأُولَٰئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ ﴾، وە هەر ئەوانەن سەرفرازو بە مراز گەیشتوو.

## چەند مەسەلەیەکی گرنگ

**مەسەلەی یەکەم:** پیتە پچڕپچڕەکان بەگشتی لەپێش (٢٩) سوورەتەوە هاتوون، سێ (٣) سوورەتیان یەك پیتیان لە پێشە، کە: (ص ، ق ، ن)ن، وە دە (١٠) سوورەتیان بە دوو پیت هاتوون، کە (حم)ەکانن لەگەڵ (یس، طە)دا، وە سێزدە (١٣)یان بە سێ پیت هاتوون، وەك (الم ، الر)، وە دوو سوورەتیان چوار پیت هاتوون، وەك: (المص، المر) وە یەك سوورەتیان بە پێنج (٥) پیت هاتوە، کە سوورەتی مەریەمە (کهیعص)، وە هەموو ئەو پیتانەی، کە لە پێش ئەو بیست و نۆ (٢٩) سوورەتەوە هاتوون، چواردە (١٤) جۆرە پیتن، واتە: نیوەی ئەو پیتانەی کە زمانی عەرەبییان لێ پێکهاتوە.

**مەسەلەی دووەم:** بۆچی لێرە هیدایەتی قورئان تایبەت کراوە بە ئەهلی تەقواوە ﴿ هُدًى لِّلْمُتَّقِينَ ﴾؟ لە حاڵێکدا کە خوا قورئانی بۆ هەموو کەس ناردوە (هُدى للنَّاس)؟ وەڵامەکەی ئەوەیە کە: لەڕاستیدا تەنیا پارێزکارانن، کە لە قورئاندا

بەهرەمەند دەبن، بۆیە خوا ﷻ تایبەتی کردوە بەوانەوە، ئەگەرنا لە ئەسڵدا قورئان بۆ هەموو کەس هاتوە، بەڵام لە سەرەنجامەکەیدا کێ لە قورئان سوودمەند دەبێت؟ کێ قورئان دەکاتە چرایەكو بەرپێی خۆی پێ دەبینێ، پێی دەگاتە ئاواتو ئامانجەکانی لە دنیاو دوارۆژدا؟ ئەهلی تەقواو پارێزکاران، بۆیە خوای زاناو توانا تایبەتی کردوە بەوانەوە، هەرچەندە لە ئەسڵدا بەگشتی بۆ مرۆڤو جند هاتوە.

**مەسەلەی سێیەم:** جێی سەرنج ئەوەیە، کە خوای کاربەجێ لە سەرەتای سوورەتی بەقەرەدا، کە بۆ پێکهێنانو بنیاتنانی کۆمەڵگای ئیسلامی هاتوە، فەرموویەتی: ﴿ ذَٰلِكَ ٱلْكِتَٰبُ لَا رَيْبَ ۛ فِيهِ ﴾، دیارە ئەوە لێی وەردەگیرێ کە: کۆمەڵگایەکی ساغو سەلیم دەبێ لەسەر بناغەی بەرنامەیەك کە جێی گومانو مشتومڕو دڵ لە دڵدان نەبێ، ژیانی خۆی بنیات بنێ، نەك هەر ڕۆژەی بکەوێتە شوێن بیردۆزەیەك کە لە عەقڵو ئەزموونی ئینسانێکەوە سەرچاوەی گرتوەو، نازانێ نە ڕاست دەردەچێ نە درۆ! دیارە زۆریشمان بینی خەڵکێك کەوتنە دوای کوێرە ڕێیەكو بە شوێن ڕێچکەو بیردۆزەیەکدا ڕۆیشتنو دوای سی (٣٠) ساڵ گوتیان، کاکە بۆمان دەرکەوتوە ڕێیەکەمان غەڵەت بووە، دەبێ بگەڕێینەوەو لە نووکەوە لە ڕێیەکی دیکەوە تێهەڵچینەوە!

بەڵام ئیسلام هەر لە سەرەتاوە ژیانی مسوڵمانان لەسەر بناغەی کتێبێکی ڕۆشن کە هیچ گومانو مشتومڕێك هەڵناگرێ، کتێبێکی ڕێ پیشاندەرو ڕێنماییکەر، بەرچاو ڕۆشنکەرەوە، بنیات دەنێ.

**مەسەلەی چوارەم:** کە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ يُؤْمِنُونَ بِٱلْغَيْبِ ﴾، پێویستە بزانرێ کە (ئیمان) تەنیا بریتی نیە لە قسەیەك کە بە زار بگوترێ، بەڵکو حەقیقەتێکە بە عەقڵ دەرك دەکرێو بە دڵ قەبووڵ دەکرێو بە زمان دەردەبڕڕێو، بە ئەندامەکانیش جێبەجێ دەکرێ. دوایش لە دەرسەکانی دیکەدا زیاتر باسی ئیمان دەکەینو تیشکی دەخەینە سەر.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ

# دەرسی چوارەم

## پێناسـەی ئەم دەرسـە

ئـەم دەرسـی چـوارەمەمان لـە ئایەتـەکانی ژمـارە (٦ تـاکو ٢٠) لـە ئایەتـەکانی سەرەتای سوورەتی (البقرة) دەگرێتـە خۆی، لـەم پازدە (١٥) ئایەتـەدا، دوو ئایـەتی سەرەتایان پێناسەی کافران دەکەن، ئایا ئەهلی کوفر کێن؟ وە ئایەتەکانی دی، واتە: ئـەو سـێزدە ئایەتـەی دوایـی دێـن، هـەموویان باسـی مونـافیق‌و دووڕووەکانمـان بـۆ دەکەن، ئیـدی سـەرجەم - وەك لـە سـەرەتای دەرسـی پێـشوودا باسمـان کـرد- خـوای بەرزو پاك (٢٠) ئایەتی تەرخان کردوە بۆ پێناسەکردنی سێ کۆمەڵە خەڵك:

١) مسوڵمانان کە بە پارێزکاران پێناسـەی کـردوون‌و بـە پێـنج ئایـەتان پێناسـەی ئەوان دەکـات.

٢) کافران کە بە دوو ئایەتان پێناسـەیان دەکات.

٣) مونافیقان کە بە سێزدە ئایەتان پێناسەیان دەکات، هەڵبەتە ئەمە لێرەدا ئەوە دەگەیـەنێ کـە بەڕاسـتی حاڵـەتی (نیفـاق) حاڵـەتێکی زۆر دژوارەو ناسـینی مونافیقـەکان شـتێکی ئاسـان نیـە، بۆیـە خـوا ﷻ (١٣) ئایـەتی بـۆ تـەرخان کـردوون، هـەر لـەم سـوورەتەدا، دیارە لـە سـوورەتی (النسـاء)و لـە سـوورەتی (التوبـة)و سـوورەتی (الـمنافقون)یـشدا کـە هـەر سـوورەتێکی تایبەتـە بـە مونافیقانـەوە، وە لـە گەلـێ شـوێنی دیکـەی قورئانـدا، خـوای کاربـەجێ باسـی مونافیقەکان دەکات، ئەوە وەك پێناسەی بابـەتی ئـەم پازدە ئایەتـە، کـە ئێمـە خوا پشتیوان بێ لەم دەرسەماندا تەفسیریان دەکەین.

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ سَوَآءٌ عَلَيْهِمْ ءَأَنذَرْتَهُمْ أَمْ لَمْ تُنذِرْهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ ۝٦ خَتَمَ ٱللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ وَعَلَىٰ سَمْعِهِمْ ۖ وَعَلَىٰٓ أَبْصَـٰرِهِمْ غِشَـٰوَةٌ ۖ وَلَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ ۝٧ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَقُولُ

ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَبِٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ وَمَا هُم بِمُؤْمِنِينَ ﴿٨﴾ يُخَٰدِعُونَ ٱللَّهَ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَمَا يَخْدَعُونَ إِلَّآ أَنفُسَهُمْ وَمَا يَشْعُرُونَ ﴿٩﴾ فِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ فَزَادَهُمُ ٱللَّهُ مَرَضًا ۖ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌۢ بِمَا كَانُوا۟ يَكْذِبُونَ ﴿١٠﴾ وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ لَا تُفْسِدُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ قَالُوٓا۟ إِنَّمَا نَحْنُ مُصْلِحُونَ ﴿١١﴾ أَلَآ إِنَّهُمْ هُمُ ٱلْمُفْسِدُونَ وَلَٰكِن لَّا يَشْعُرُونَ ﴿١٢﴾ وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ ءَامِنُوا۟ كَمَآ ءَامَنَ ٱلنَّاسُ قَالُوٓا۟ أَنُؤْمِنُ كَمَآ ءَامَنَ ٱلسُّفَهَآءُ ۗ أَلَآ إِنَّهُمْ هُمُ ٱلسُّفَهَآءُ وَلَٰكِن لَّا يَعْلَمُونَ ﴿١٣﴾ وَإِذَا لَقُوا۟ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ قَالُوٓا۟ ءَامَنَّا وَإِذَا خَلَوْا۟ إِلَىٰ شَيَٰطِينِهِمْ قَالُوٓا۟ إِنَّا مَعَكُمْ إِنَّمَا نَحْنُ مُسْتَهْزِءُونَ ﴿١٤﴾ ٱللَّهُ يَسْتَهْزِئُ بِهِمْ وَيَمُدُّهُمْ فِى طُغْيَٰنِهِمْ يَعْمَهُونَ ﴿١٥﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ ٱشْتَرَوُا۟ ٱلضَّلَٰلَةَ بِٱلْهُدَىٰ فَمَا رَبِحَت تِّجَٰرَتُهُمْ وَمَا كَانُوا۟ مُهْتَدِينَ ﴿١٦﴾ مَثَلُهُمْ كَمَثَلِ ٱلَّذِى ٱسْتَوْقَدَ نَارًا فَلَمَّآ أَضَآءَتْ مَا حَوْلَهُۥ ذَهَبَ ٱللَّهُ بِنُورِهِمْ وَتَرَكَهُمْ فِى ظُلُمَٰتٍ لَّا يُبْصِرُونَ ﴿١٧﴾ صُمٌّۢ بُكْمٌ عُمْىٌ فَهُمْ لَا يَرْجِعُونَ ﴿١٨﴾ أَوْ كَصَيِّبٍ مِّنَ ٱلسَّمَآءِ فِيهِ ظُلُمَٰتٌ وَرَعْدٌ وَبَرْقٌ يَجْعَلُونَ أَصَٰبِعَهُمْ فِىٓ ءَاذَانِهِم مِّنَ ٱلصَّوَٰعِقِ حَذَرَ ٱلْمَوْتِ ۚ وَٱللَّهُ مُحِيطٌۢ بِٱلْكَٰفِرِينَ ﴿١٩﴾ يَكَادُ ٱلْبَرْقُ يَخْطَفُ أَبْصَٰرَهُمْ ۖ كُلَّمَآ أَضَآءَ لَهُم مَّشَوْا۟ فِيهِ وَإِذَآ أَظْلَمَ عَلَيْهِمْ قَامُوا۟ ۚ وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ لَذَهَبَ بِسَمْعِهِمْ وَأَبْصَٰرِهِمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿٢٠﴾ ﴾

## مانای وشه به وشەی ئایەتەکان

((بێگومان ئەوانەی کافرن یەکسانە بۆیان بیانترسێنی یان نەیانترسێنی، ئیمان ناهێنن ﴿٦﴾ خوا دڵو گوێیانی مۆرکردوە، وە پەردەی بەسەر چاویان هەڵکێشاوە، وە ئازارێکی مەزنیان بۆ هەیە ﴿٧﴾ وە جۆرە کەسێك لەنێو خەڵکی هەن دەڵێن: بڕوامان بە خواو بە ڕۆژی دوایی هێناوە، لە حاڵێکدا کە ئیماندار نین، ﴿٨﴾ وە بە خەیاڵی خۆیان خواو ئەوانەی ئیمانیان هێناوە فریو دەدەن، بەڵام خۆیان هەڵدەخەڵەتێنن، ئەوەندە هەیە هەست ناکەن ﴿٩﴾ دڵیان نەخۆشیی تێدایەو خواش نەخۆشییەکەیانی بۆ زیاد کردوون، وە بەهۆی درۆکردنیانەوە ئازارێکی بە ئێشیان

هەیە (لە دوا ڕۆژدا) ﴿١٠﴾ وە ئەگەر پێیان بگوترێ: ئاشووب لە زەویدا بەرپا مەکەن! دەڵێن: ئێمە بەس چاکسازییکەرین! ئاگاداربن کە هەر ئەوان خراپەکارن، بەڵام هەست ناکەن ﴿١١﴾ وە ئەگەر پێیان بگوترێ: بڕوا بێنن وەك چۆن خەڵك بڕوایان هێناوە! دەڵێن: ئایا وەك نەفامەکان بڕوا بێنین؟ ئاگاداربن کە هەر ئەوانەن نەفام، بەڵام بەخۆیان نازانن ﴿١٢﴾ وە کاتێك بەوانەی ئیمانیان هێناوە دەگەن، دەڵێن: ئیمانمان هێناوە، بەڵام کە بە تەنیا لەگەڵ (سەرکردە) شەیتانەکانیان کۆدەبنەوە، دەڵێن: ئێمە هەر لەگەڵ ئێوەین، ئێمە بەس گاڵتەکەرین (بە بڕواداران) ﴿١٣﴾ خوا گاڵتەیان پێ دەکاتو لە یاخی بوونیاندا ڕستیان بۆ درێژ دەکات، کە بە سەرگەردانیی بمێننەوە ئەوانە گومڕاییان بە ڕێنمایی کڕیوە ﴿١٤﴾، جا بازرگانییەکەیان قازانجی نەکردوە، وە لە ڕێی ڕاستگرتووان نین ﴿١٥﴾ وێنەیان (واتە: وێنەی مونافیقەکان) وەك وێنەی کەسێکە ئاگرێکی کردۆتەوە جا کاتێك دەوروبەری ڕۆشن کردەوە ﴿١٦﴾ خوا ڕووناکییەکەیانی نەهێشت، وە لە تاریکییەکاندا بەجێی هێشتن، کە هیچ نابینن ﴿١٧﴾ ئەوانە کەڕو لاڵو کوێرن، بۆیە ناگەڕێنەوە ﴿١٨﴾ یان (وێنەیان) وەك کەسانێك وایە کە هەورێکی باراناویی لە ئاسمانەوە دەوری گرتبن، کە تاریکاییو هەورە تریشقەو برووسکەی تێدا بێت، وە لە حەژمەتی گرمەو هاڕەی هەورە تریشقەکان پەنجەکانیان لە ترسی مەرگ بخەنە گوێیانەوە، وە خوا دەوری کافرانی داوەو لێی دەرباز نابن ﴿١٩﴾ نزیکە برووسکە چاویان کوێر بکات، هەرکە چەخماخە بداتو دەوروبەریان ڕۆشن بکاتەوە، لەبەر ڕۆشناییدا دەڕۆن، وە کاتێك تاریکییان بەسەر هەڵکشا، لەجێی خۆیان دەوەستن، وە ئەگەر خوا ویستبای گوێو چاوەکانیانی لەکار دەخست، بێگومان خوا لەسەر هەموو شتێك توانایە ﴿٢٠﴾))

## شیکردنەوەی هەندێك لە وشەكان

(ءَأَنذَرْتَهُمْ): (الإِنـذَار: إعـلامٌ أَو إخْبـارٌ مَـعَ تَخْـويفٍ) واتـه: (إنـذَار) بریتیـه لـه ئاگـاداركردنەوەیەك، یان هەواڵ پێدانێك، كه ترسـاندنی لەگـەڵ دابێ.

(خَتَمَ): (الخَتمُ وَالطَبْعُ، الإستِيثاقُ مِنَ الشَّيءِ، وَالمَنعُ مِنهُ، أو هُو تَأثيـرُ الشَّيءِ كَنَقْـشِ الخَـاتِمِ) دیـاره لـه قورئانـدا وێـڕای (خـتم) (طَبْـع)یـش هـاتوه، كـه مەبەست پێی ئەوەیـه وەك چۆن مـۆر بـه شـتێكەوە دەنێـی شـوێنی لێدەكات، ئەوانەش كوفرو بێدینیی ئاوا شوێنی له دڵیان كردوەو، نەخشی لەسەر دڵیـان بەسـتوە، ئـەوە مانایـەكی، مانایـەكی دیكـەی ئەوەیـه كـه وەك چـۆن كەسـێك نامەیەك دەنووسێو له كۆتاییەكەیدا خەتمی دەكات، یاخود لەسەر زەرفەكـەی مۆرێكی لێدەدا، واته: داخراوەو تـەواو بـووە، ئەوانـەش دڵیـان ئەوەنـدەی كـوفر چۆته نێو، كه داخراوەو، وەك نامـەیەكی خەتمكراو دڵیان كۆتایی پێ هاتوه.

(تُفْسِدُواْ): (الفَسَادُ: خُرُوجُ الشَّيءِ عَنِ الإعتِدالِ وَيُضـادُّهُ الصَّلاحُ) واته: (الفَسَادُ) بریتیه له دەرچوونی هەر شتێك له خـەتی نێوەڕاسـتو حاڵـەتی هاوسـەنگیی، پێچەوانەی (صلاح)ە، كه بریتیه لەوە شـت حـاڵەتی باشو هـاوسـەنگی هەبێ.

(ٱلسُّفَهَآءُ): واته، نەفامەكان (السَّفَهُ: خِفَّةٌ فـي البَدَنِ، وَثَوْبٌ سَفِيةٌ: رَدِيءُ النَّسْجِ واسْتُعمِلَ في خِفَّةِ النَّفْسِ لِنقْصَانِ العَقْلِ) واته: وشـەی (السَّفَهُ) بـه مانـای قالب سووكیی دێت، وە قوماشێك كـه بـاش نەچنرابێ (سفیه)ی پـێدەگوترێ، واتـه: بـاش نەچـنراوەو سـووكه، پاشـان بەكـارهێنراوەو خوازراوەتـەوە بـۆ سووكیی نەفس لەبەر عەقڵی سـووك، چونكه عەقـڵ بریتیـه لـه حەقیقـەتی ئینسانو بریتیه له كاكڵی ئینسـان، بۆیـەش خـوای زانـا نـاوی لـه عەقـڵ نـاوە (لُـبّ)، وە بـه ئینسـانانی خـاوەن عـەقڵ دەفـەرموێ: (أولـي الألْـبَاب) خـاوەن عەقـڵان، چـونكه عەقـڵ كاكڵـەی ئینسـانەو ئینسـان كـه عەقـڵەكەی بەكارنەهێنـا، وەك گوێزی قڕپۆك وایه كـه كاكڵی نەبێت.

(خَلَوْا ): (خَلا الإنسانُ صَارَ خَالِياً) واتە: مرۆڤ لە شوێنێکی چۆڵ بوو (خَلَى فُلانٌ بِفُلانٍ: صَارَ مَعَهُ في خَلاءٍ) واتە: دەگوترێ فلان لەگەڵ فلان کەس خەڵوەتی کرد، واتە پێکەوە بوون لە شوێنێکی چۆڵ (وخَلا إليهِ انتَهى إليهِ في خَلْوَةٍ)، واتە: بە تەنیا چووە لای لە شوێنێکی چۆڵ.

(شَيَٰطِينِهِمْ ): لێرەدا واتە: (رُؤسـاُهُم) سەرکردەکانیان، چونکە دەڵێ: (الشَّيطانُ: كُلُّ رَأسٍ فِي البَاطِلِ) هەر کەسێك کە سەرکردەو دەمڕاست بێ لە ناهەقیدا، وە لێرەدا (شَياطِينِهِم)، واتە: سەرکردەکانیان لە (نیفاق)و کوفردا.

(يَسْتَهْزِئُ ): (الهُزْءُ: مَزحٌ فِي خُفيَةٍ) وشەی (الهَزء) بریتیە لە گاڵتە پێکردنێکی بە پەنهانیی.

(طُغْيَٰنِهِمْ ): (الطُغيان: تَجاوُزُ الحَدِّ في العِصيَانِ، قَالَ تعَالى: ﴿ ٱذْهَبْ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ إِنَّهُۥ طَغَىٰ ﴿١٧﴾ ﴾ النازعات، واتە: هەر شتێ کە ئینسان سنووری تێدا بەزاند، پێی دەگوترێ (طُغیان)، وەك خوای بەرز فەرموویەتی (بە مووسا): بچۆ لای فیرعەون بێگومان یاخی بووە .

(يَعْمَهُونَ ): (العَمَهُ: التَّرَدُّدُ في الأَمرِ مِنَ التَّحَيُّرِ) وقَالَ تعَالى: ﴿ ... زَيَّنَّا لَهُمْ أَعْمَٰلَهُمْ فَهُمْ يَعْمَهُونَ ﴿٤﴾ ﴾ النمل، واتە: (العَمَهُ) ئەوەیە کە ئینسان لە لەرەلەردا بێ دڵ لە دڵبدا، لە ئەنجامی سەراسیمەیی لە کارێکدا، وەك خوای بەرز فەرموویەتی: (کردەوەکانیانمان بۆ ڕازاندوونەوەو سەرگەردانن) .

(مَثَلُهُمْ ): وێنەی ئەوان. وشەی (مَثَلْ) لە زمانی عەرەبیدا بە مانای سیفەت دێت وەك خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ ... وَلَهُ ٱلْمَثَلُ ٱلْأَعْلَىٰ ... ﴿٢٧﴾ ﴾ الروم، واتە: سیفەتی هەرە بەرز بۆ خوایە. وە (مَثَل) بە مانای وێکچوونی شتێك بە شتێك دێت، واتە بە مانای (شَبَه) دێتو ئەوکاتە مانای (مِثْل) دەگەیەنێ، دەگوترێ: (هذا مَثَلُ هذا أو مِثْلُ هذا) ئەو شتە وەك ئەو شتە وایە، وە لێرەدا وشەی (مَثَلْ) بۆ ئەوە بەکارهاتوە، کە حاڵەتێك بە حاڵەتێکی دیکە چووێنراوە، دیارە لە

زمانی عەرەبیدا وشەی (مَثَلْ) بە (أمثال) كۆدەكرێتەوە، وەك خوای زاناو توانا لە سوورەتی (العنكبوت) ئایەتی (٤٣)دا، دەفەرموێ: ﴿ وَتِلْكَ ٱلْأَمْثَٰلُ نَضْرِبُهَا لِلنَّاسِ وَمَا يَعْقِلُهَآ إِلَّا ٱلْعَٰلِمُونَ ﴾، واتە: ئەو وێنانە بۆ خەڵكی دێنینەوە، بەڵام تەنیا زانایان لێیان تێدەگەن.

(صُمٌّ): كۆی (أَصَمّ)، (أصَم)یش واتە: كەڕ، (صُمّ): كەڕەكان.

(بُكْمٌ): كۆی (أبْكَمَ)، یان كۆی (بَكْم)، واتە: لاڵ، (بُكْمُ): لاڵەكان.

(عُمْيٌ): كۆی (أعْمَى)یە، واتە: كوێر، (عُمِيّ): كوێرەكان.

(كَصَيِّبٍ): (صَيِّب) بە دوو واتا هاتوە، هەم بە مانای باران (مَطَر)و هەم بەمانای هەور، جا ئەگەر بە مانای باران بێت، بۆیە ئەو ناوەی لێنراوە، چونكە لە ئاسمانەوە بەرەو خوار دێت.

(وَرَعْدٌ): هەورە تریشقە، دەنگی هەور.

(ٱلْبَرْقُ): برووسكە، كە بریتیە لەو تیشكەو ڕۆشناییەی، كە لە ئەنجامی بەریەككەوتنی هەورەكان پەیدا دەبێ (دیارە هەورە تریشقەو برووسكەش لەوە پەیدا دەبن).

(ٱلصَّوَٰعِقِ): كۆی (الصاعِقَة) یە: (هِيَ الصَّوْتُ الشَّدِيدُ مِنَ الجَوِّ، ثُمَّ قَدْ يَكُونُ فِيهَا نَارٌ فَقَط، أَو عَذَابٌ أو مَوْتٌ، وهِيَ في ذاتها شيءٌ واحدٌ) بریتیە لە دەنگێكی بەهێز، كە لە سەرێوە دێت، جا جاری وا هەیە بەس ئاگری تێدایە، وە جاری وا هەیە دەبێتە هۆی عەزابو مەرگ، بۆیە لە قورئاندا بە مانای مردنیش هاتوەو بە مانای ئاگریش بەكارهاتوە، وە بە مانای ئەو دەنگە بە هێزەش كە لەسەرێوە دێت، هاتوە.

(يَخْطَفُ): (الخَطْفُ وَالإِخْتِطَافُ: هُوَ الإختلاسُ بالسُّرْعَةِ) دەگوترێ: (خَطِفَ يَخْطَفُ) وە دەگوترێ: (خَطَفَ يَخْطَفُ)، واتە: شتێك بە زوویی بە خێرایی بڕفێنی، یان بیدزی.

## مانـــای گـشــتی ئایەتەكـــان

خوای پـەروەردگار دوای ئـەوەی باسـی پارێزكارانی كـرد، وە باسـی سەرەكیتـرین سـیفەتەكانی ئیمانـدارانی پارێزكاری كـرد، كـە بـریتی بـوون لـە: بڕواهێنـان بـە پەنهـانو نوێژ بەرپاكردنو بەخشین لەوەی كە خـوا پێی داون، وە ئیمانهـێنان بە قورئان، وە بە هەموو كتێبەكانی كە خـوا ناردوونیـە خـوار، وە یـەقین هـەبوون بـە دوارۆژ، كـە ئـەوانـە پێـنج سـیفەتی بەرجەسـتەو سـەرەكیی هـەر ئینـسـانێكن كـە بیـەوێ كەسایەتییەكی ئیمـانییو ئیـسلامیی تێـرو تـەواویی هـەبێ، وە سـووڕەتی بەقەڕەش باسمان كرد، كە لە سـەرەتای بنیاتنـانی كۆمـەڵگای ئیـسلامییو دەوڵـەتی ئیسلامییدا هاتۆتـە خـوار، بۆیـە باسـی ئـەو سیفەتانەی كـردوە، كـە دەبـێ هـەموو ئینـسـانێكی مـسـوڵمان كەسایەتی خۆیانیـان لەسـەر بنیـات بنـێ، ئنجـا خـوای بـێ هـاوەڵ، لە دوو ئایەتدا باسی سەرەكیتـرین سیفەتی كـافـرەكان دەكـات دەفـەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ سَوَآءٌ عَلَيْهِمْ ءَأَنذَرْتَهُمْ أَمْ لَمْ تُنذِرْهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ ﴾، واتـە: ئـەوانـەی بـێبڕوان، یەكـسـانە، بیانتـرسـێنی یـا نەیانتـرسێنی، ئاگاداریـان بكەیـەوە لەگـەڵ ترساندن، یـاخود لـێیان بگـەڕێی، ئیمـان هـەر نـاهێنن، پاشـان لـە ئایـەتی دواییـدا هۆكـارو عیللـەتی ئیمـان نەهێنانەكـەیان ڕووندەكاتـەوە، كـە: ﴿ خَتَمَ ٱللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ وَعَلَىٰ سَمْعِهِمْ ۖ وَعَلَىٰٓ أَبْصَـٰرِهِمْ غِشَـٰوَةٌ ۖ وَلَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴾، خـــــوا دڵو گوێیـــــانی مـــۆركردوە، وە پـــەردە بەســـەر چـاویان هەڵكـشـاوە، وە ئـازارێكی مـــەزنیان بـــۆ ئامـادەكراوە، لێـرەدا پێویـستە بـزانین كـە مەبەسـت لـە مـۆری خـوا بەسـەر دڵـی كافرانو بەسەر گوێیانـەوەنران، وە پـەردە بەسـەر چاو هەڵكشانیان، ئەوەنیـە كـە خوا ﷻ نەهێڵێ ئیمان بێـنن! بەڵـكو ئـەوە ڕوونكردنـەوەی یەكێكـە لـە سـوننەتو یاسـاكانی خـوای ﷻ كـە هەركەسـێ كاتـێ بـانگی تەوحیـدی پێـدەگاتو بـانگی پێغەمبەرانی پێدەگـات، گوێی نەداتێو پشتی تێ بكات، ئـەم هەڵوێـستە دڵـی ڕەش دەكات، دوایـی كـە بـەردەوام دەبێـت لەسـەر هەڵوێـستی دژی هیدایـەتی خـوا، خـاڵی ڕەشی زیاتر لەسەر دڵی پەیدا دەبێت، هەتا وای لـێدێت دەگـاتە قۆناغێـك كـە پێـی

دەگوترێ، قۆناغی (خَتْم) یاخود قۆناغی (طَبْع)، بە بەڵگەی ئەوە کە خوای کاربەجێ لەوبارەوە دەفەرموێ: ﴿ وَقَوْلِهِمْ قُلُوبُنَا غُلْفٌۢ بَلْ طَبَعَ ٱللَّهُ عَلَيْهَا بِكُفْرِهِمْ ﴿١٥٥﴾ ﴾ النساء، واتە: وە (جوولەکەکان) گوتیان: ئێمە دڵمان لەنێو کیف دایەو هیدایەتی ناچێتە نێو! نەخێر بەڵکو بەهۆی کوفرەکەیانەوە، خوا مۆری بەسەر دڵەوە ناون، ئەگەرنا وەنەبێ خوا زوڵمی لێکردبن خوا زوڵمی لێنەکردوون، بەڵام بۆ خۆیان کارێکی وایان لەگەڵ خۆیان کردوە، کە ناتوانن هیدایەتی خوا وەربگرن‌و ئامێرە وەرگرەکان (أجهزة الإستقبال)یان لە خۆیاندا پەککەستوە، وەك چۆن جیهازێکی ڕادیۆ ئەگەر شکاندت‌و تێکتدا، تازە شەپۆڵە دەنگییەکان وەرناگرێ، هەروەها جیهازێکی تێکچووی تەلەفزیۆن، شەپۆلە دەنگییەکان وەرناگرێ، لەبەرئەوەی کە پەکی خراوەو تێکچووە.

ئنجا دێینە سەر باسی مونافیقەکان، کە خوای بەرزو مەزن لەبارەیانەوە فەرموویەتی: ﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَقُولُ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَبِٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ وَمَا هُم بِمُؤْمِنِينَ ﴾، سەرەتا بە شێوەیەکی نەناسراوو نامۆ (مَجهُول) باسیان دەکات، کە لەنێو خەڵکیدا کەسانێك هەن ئیددیعای ئیمان دەکەن‌و دەڵێن ئیمانمان هێناوە، کەچی ئیمانیشیان نەهێناوە، بۆیە بە شێوەیەکی نەناسراو باسیان دەکات، چونکە بە کردەوە مونافیقەکان خۆیان نەناس دەکەن‌و خۆیان پەنهان دەکەن‌و، سەد دەمامك بۆ خۆیان دروست دەکەن، دیارە ئەوە تایبەتمەندیترین سیفەتی مونافیقەکانە، کە خۆیان بە مسوڵمان دەناسێنن، بەڵام مسوڵمان نین، واتە: لە دەروونیاندا ئیسلام و ئیمان نیەو، لە هەڵسوکەوتیاندا ئیمان‌و ئیسلامەتی‌و دینداریی‌و مسوڵمانەتیی نابینی، ﴿ يُخَٰدِعُونَ ٱللَّهَ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَمَا يَخْدَعُونَ إِلَّآ أَنفُسَهُمْ وَمَا يَشْعُرُونَ ﴾، ئەدی بۆچی دەڵێن ئیمانمان هێناوە؟ دیارە دەیانەوێ فێڵ بکەن‌و بە خەیاڵی خۆیان فێڵ لە خوا بکەن‌و فێڵ لە ئیمانداران بکەن، لە حاڵێکدا کە تەنیا خۆیان هەڵدەخەڵەتێنن، چونکە نە خوا فێڵی لێدەکرێ ﷻ وە نە ئیماندارانی عاقڵ‌و تێگەیشتووش فێڵیان لێ دەکرێ، بەڵکو وەرەقەی سپی دەخوێننەوەو بە

ئیددیعای کابرایەکی موونافیقی درۆزن، یان ئافرەتێکی موونافیقی دەغەڵ هەڵناخەڵەتێن، کەواتە: زەرەری فریودانەکە تەنها بۆخۆیان دەگەڕێتەوەو، تەنیا سەرەنجامەکەی ئەوەیە کە خۆیان فریو دەدەن، کە پێیان وایە خۆیان بە مسوڵمان ناساندوە، بەڵام لە حەقیقەتدا لای خوای دادگەر نەك هەر کافرن، بەڵکو لە کافران خراپتر لە قەڵەم دەدرێن، ئنجا دەفەرموێ: ﴿ فِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ فَزَادَهُمُ ٱللَّهُ مَرَضًا ۖ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌۢ بِمَا كَانُوا۟ يَكْذِبُونَ ﴾، دڵیان نەخۆشیی تێدایە، وە خوا نەخۆشیەکەیان بۆ زیاد دەکات، چونکە خوا ﷻ سوننەتی وایەو یاسای وایە، هەرکەسێك ڕێی چاکە بگرێ، یارمەتی دەدات، وە هەرکەسێکیش ڕێی خراپە بگرێ، ئیهمالی دەکاو وێڵی دەکات، وەك لە شوێنێکی دی دەفەرموێ: ﴿ كُلًّا نُّمِدُّ هَٰٓؤُلَآءِ وَهَٰٓؤُلَآءِ مِنْ عَطَآءِ رَبِّكَ ۚ وَمَا كَانَ عَطَآءُ رَبِّكَ مَحْظُورًا ﴿٢٠﴾ ﴾ الإسراء، واتە: هەردووکیان هەر یارمەتی دەدەین، ئەوانەش‌و ئەوانەش، لە بەخششی خوا، کەسێك بیەوێ بەرەو چاکە بڕوا خوا یارمەتی دەدات، کەسێکیش بیەوێ بەرەو خراپە بڕوا، خوا شەیتانێکی بەسەردا زاڵ دەکات، کە شەیتانەکە زیاتر کردەوە خراپەکانی خۆی بۆ جوان دەکات‌و زیاتر لەلای شیرین دەبن، پاشان دەفەرموێ: ﴿ وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ لَا تُفْسِدُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ قَالُوٓا۟ إِنَّمَا نَحْنُ مُصْلِحُونَ ﴾، واتە: وە ئەگەر پێیان بگوترێ: خراپەکاریی مەکەن لە زەویدا، کە بەڕاستی حاڵەتی (نیفاق) گەورەترین خراپەکاریی تێدایە، بەر لە هەرکەس بۆ خاوەنەکەی خراپە، چونکە نەخۆشییەکی نەفسی زۆر کوشندەیە، کەچی ئەوان لەجیاتی ئەوەی ئەو قسە دڵسۆزانە وەربگرن، دەڵێن چی؟ دەڵێن: هەر ئێمەین چاکسازو، هەر ئێمەین چاکسازیی دەکەین، بۆیە خوای پەنهانبین دەفەرموێ: ﴿ أَلَآ إِنَّهُمْ هُمُ ٱلْمُفْسِدُونَ وَلَٰكِن لَّا يَشْعُرُونَ ﴾، واتە: نەخێر هەر ئەوانەن خراپەکار، بەڵام هەست ناکەن، ئەم ڕاستییە لەم ئایەتە وەردەگیرێ کە ئینسان بەهۆی کوفرو نیفاقەوە، وای لێدێ شعووری وەك پێویست نامێنێ‌و، هەست بە کوفری خۆی ناکات، هەست بە خراپەکاریی خۆی ناکات، بەڵکو بە پێچەوانەوە میزاجی وا تێکدەچێت، کە

خراپەکەی لەلا دەبێتە چاکە، وە حەرامی لەلا شیرین دەبێ، پاشان خوا دەفەرموێ: ﴿ وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ ءَامِنُوا۟ كَمَآ ءَامَنَ ٱلنَّاسُ قَالُوٓا۟ أَنُؤْمِنُ كَمَآ ءَامَنَ ٱلسُّفَهَآءُ ... ﴾، واتە: وە کاتێ پێیان بگوترێ: ئیمان بێنن وەك چۆن خەڵك ئیمانی هێناوە! دەڵێن: ئایا ئیمان بێنین وەك نەفامەکان ئیمانیان هێناوە؟! خۆیان زۆر پێ عاقڵە! وە ئەهلی ئیمانیان پێ نەفامە، بۆیە خوا ﷻ ئەو مۆرەشیان بە نێوچەوانەوە دەنێت، مۆری بێ عەقڵیی، وەك دەفەرموێ: ﴿ أَلَآ إِنَّهُمْ هُمُ ٱلسُّفَهَآءُ وَلَٰكِن لَّا يَعْلَمُونَ ﴾، نەخێر هەر ئەوانن نەفام، بەڵام نازانن، بۆ دوو حاڵەتەکەی پێشێ فەرمووی: ﴿ لَّا يَشْعُرُونَ ﴾، بەڵام بۆ ئەمەیان دەفەرموێ: ﴿ لَّا يَعْلَمُونَ ﴾، چونکە ئەوە کە ئینسان تەماشا بکا: ئایا کێ چاکەکارەو کێ خراپەکارە؟ هەر پێویستی بە هەست کردن دەکات، بەڵام ئەوە کە بزانێ: کێ ئیماندارە وە کێ بێ ئیمانە؟ ئەوە پێویستی بە زانیاری (علم) دەکاتو، پێویستی بە لێکۆڵینەوەی زیاتر دەکات، ئنجا دەفەرموێ: ﴿ وَإِذَا لَقُوا۟ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ قَالُوٓا۟ ءَامَنَّا ﴾، کە باسی دووڕوویيان دەکات، واتە: کاتێ دەگەنە ئیمانداران دەڵێن: ئیمانمان هێناوە. ﴿ وَإِذَا خَلَوْا۟ إِلَىٰ شَيَٰطِينِهِمْ قَالُوٓا۟ إِنَّا مَعَكُمْ إِنَّمَا نَحْنُ مُسْتَهْزِءُونَ ﴾، بەڵام ئەگەر بچنە لای شەیتانەکانیان، واتە: لای سەرکردەکانیان، دەڵێن: ئێمە لەگەڵ ئێوەین، ئێمە هەر گاڵتەکەرین بە ئیمانداران ﴿ ٱللَّهُ يَسْتَهْزِئُ بِهِمْ ﴾، لێرەش دیسان خوا ﷻ وەڵامیان دەداتەوەو دەفەرموێ: خوا گاڵتەیان پێ دەکات، دیارە لێرەدا گاڵتە پێکردنی خوا بە مونافیقەکان، یانی: سزایان دەدات لەسەر گاڵتە پێکردنیان، یاخود یانی: مامەڵەیەکیان لەگەڵ دەکا وەك گاڵتە پێکردن دەچێ، چونکە لە دنیا لێیان دەگەڕێ بژیەن، هەرچەندە ڕۆژ بە ڕۆژیش زیاتر جێی خۆیان خۆش دەکەن لە دۆزەخدا، کەواتە: ئەم ژیاندنەیان وەك گاڵتە پێکردن وایە! ﴿ وَيَمُدُّهُمْ فِى طُغْيَٰنِهِمْ يَعْمَهُونَ ﴾، واتە: ڕستیان لەدوا درێژ دەکات، کە لەسەرکێشیی و لە سنوور بەزاندنی خۆیاندا، ئاوا بەسەر گەردانی بخولێنەوە، ئنجا دەفەرموێ: ﴿ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ

اَشْتَرَوُا۟ ٱلضَّلَـٰلَةَ بِٱلْهُدَىٰ ﴾، ئەوانــە کەســانێکن هیدایــەتیان داوەو لــە بەرانبــەردا گومڕاییــان کڕیــوە، لەبــەر چــی؟ چــونکە دەیــانتوانی هیدایــەت وەربگــرن، وە دەشــیانتوانی کــە گــومڕابن، بۆیــە وەختــێ کــە هیدایەتەکــە ئیهمــال دەکــەن‌و گومڕاییەکـە تەبـەننی دەکـەن، وەك ئەوەیـە هیدایەتەکـەیان کردبـێ بـە نرخێك‌و گومڕاییەکەیان کردبێ بە کاڵایەك‌و کڕیبیان، لە کۆتاییدا دەفەرموێ: ﴿ فَمَا رَبِحَت تِّجَـٰرَتُهُمْ وَمَا كَانُوا۟ مُهْتَدِينَ ﴾، واتە: بازرگانییەکەیان سوودی نەکردوە، وە ڕێگای ڕاسـتیشــیان نەگـرتوە.

خــوا ﷻ لــە ئایەتــەکانی پێــشەوەدا باســی کۆمەڵــێك لــە ســیفەتەکانی مونافیقەکـانی کـرد، کـە سـەرجەم دە سـیفەت بـوون، ئنجـا بۆئـەوەی زیـاتر حـاڵ‌و وەزعــی مونافیقــەکان ڕوونبکاتــەوە، دوو وێنــەی هێناونــەوە، ســەرەتا وێنەیــەکی ئــاگریی، دەفــەرموێ: ﴿ مَثَلُهُمْ كَمَثَلِ ٱلَّذِى ٱسْتَوْقَدَ نَارًا فَلَمَّآ أَضَآءَتْ مَا حَوْلَهُۥ ذَهَبَ ٱللَّهُ بِنُورِهِمْ ﴾، واتــە: وێنــەی مونافیقەکــان (ئەگــەر بتــەوێ لێــیان تێبگــەی)، حاڵەتیان‌و سیفەتیان، وەك هی کەسێك وایە، کە ئاگرێك دەکاتەوە دوای ئەوەی ئەو ئــاگرە مەشــخەڵی پەیــدا دەبێــت‌و دەوروبــەری ڕۆشــن دەکاتــەوە، دیــارە لێــی بەهرەمەند دەبێت، هەرئەوەندە دەزانی کـتوپڕ ئاگرەکەی دەکوژێتەوە !

جێــی ســەرنجە کــە لێــرەدا نەیفــەرمووە: خــوا ئاگرەکــەیانی کوژانــدەوە، بەڵــکو سەرەنجامی ئاگـر کوژانەوەکەی باس کردوە، کە بریتیە لـەوەی ڕۆشناییان نامێنــێ، وە نەشــی فــەرمووە: تیــشك (ضُوء)ەکــەیانی نەهێــشت، بەڵــکو فەرموویــەتی: نوورەکەیانی نەهێشت، چونکە دەگونجێ تیشك (ضُوء) نـەبێت، بـەڵام جۆرێـك لـە ڕۆشـنایی هـەر هـەبێت، بـەڵام وەختــێ کـە ئینســان ڕووناکی (نـور)ی نـەما، ئـەوە چاکتـر (بطريق الأولى) (ضوء)ی نەماوە، ئینسانی مونافیقیش کە ئیمان دێنێ‌و ئیعلانی ئیمان‌و ئیسلامەتیی خۆی دەکات، دڵ‌و دەروونی ڕۆشن دەبێتـەوەو ژیـانی ڕۆشن دەبێتەوە، بەڵام کاتێك دەگەڕێتەوە بۆ کوفر، وەك ئەو کەسە وایە کـە لەبـەر ڕۆشناییدا بووبێ‌و دوایی کەوتبێتە نێو تاریکــیی پاشان دەفــەرمووێ: ﴿ وَتَرَكَهُمْ فِى

ظُلُمَٰتٖ لَّا يُبۡصِرُونَ ﴾، واتە: (دوای ئەوەی ئاگرەکەیان دەکوژێتەوە) لێیان دەگەڕێ لە چەند تاریکاییەکدا بن کە هیچ نابینن، لە قورئاندا هەمیشە وشەی ڕووناکی (نور) بە تاك هاتوە، بەڵام تاریکییەکان (ظلمات) بە کۆ هاتوون، چونکە ڕووناکی هێماو ڕەمزی هەقە، هەقیش هەمیشە یەکە، بۆ وێنە: (٢+٢=٤) ئەنجامی ڕاست تەنیا چوارە، وە ئەگەر بڵێی (٥) یان بڵێی (٦) یان، وە بڵێی (٣) یان هەر ژمارەیەکی دیکە بەبێ کۆتایی، هەر هەمووی هەڵەیە، بەڵێ ناهەق (باطل) هەمیشە (متعدّد)ە، بەڵام هەق یەکێکە، بۆیە هەمیشە خوا ﷻ (نور)ی بەیەك هێناوە، بەڵام (ظلمات)ی بە کۆ هێناوە، ﴿ صُمُّۢ بُكۡمٌ عُمۡيٞ ﴾، واتە: ئەو موناقیقانە لە ئەنجامی ئەوەدا کە کوفریان لە دڵی خۆیاندا جێ کردۆتەوە، وایان لێهاتوە وەك کەسێك بن کە کەڕبێ، لاڵ بێ، کوێر بێ، واتە: ئەو هێزانەی کە خوا بە ئینسانی داون، بۆ ئەوەی کە هەقیان پێ ببیستێ، وە شتیان پێ ببینێ، وە بۆ ئەوە کە تەعبیریان پێبکا لەوەی کە لە دڵو دەروونیاندایە، ئەو هێزانەیان لەکارخستوەو نە هەق دەبیستن، نە هەق دەبینن، نە هەقیش دەڵێن، دیارە ئەو دوو کەسەش یەکسانن، کە یەکێکیان کەڕو لاڵو کوێرەو، ئەویدیکەش گوێی هەبێو چاوی هەبێتو زمانی هەبێت، بەڵام نە بە گوێی هەق ببیستێو، نە بە چاوی هەق ببینێو، نە بە زمانەکەشی هەق بڵێ، چونکە سەرەنجامی کردەیی هەردووکیان وەك یەکە! دوایی دەفەرموێ: ﴿ فَهُمۡ لَا يَرۡجِعُونَ ﴾، واتە: لە ئەنجامی ئەوەدا کە گوێیەکیان نیە هەقی پێ ببیستن، وە چاوێکیان نیە کە هەقی پێ ببینن، وە زمانێکیان نیە هەقی پێ بڵێن، ناشتوانن بگەڕێنەوە، لەم ڕستە قورئانییەوە دەردەکەوێ، کە ئینسان ئەگەر لەسەر کوفرو تاوانو گوناح بەردەوام بوو، وایلێدێ بەربەستێکی لەبەردەمدا پەیدا دەبێتو دواییش ناتوانێت بگەڕێتەوە، وەك چۆن کەسێك سەرەتا ئیرادەو ئیختیاری بەدەست خۆیەتی، بەڵام کە دەکەوێتە لێژایی، دوای ئەوەی لە ئەنجامی بەردەوامی (استمرارية)دا تەماشا دەکەی خۆی بۆ ناگیرێتەوە، دوای ئەوەی کە دەکەوێتە خێرایی، وەك چۆن سەیارە کە ئیستاپی دەپچڕێو لە سەرەوژێر دێتە خوارێ، دیارە خۆی بۆ ناگیرێتەوە!

ئنجا وێنەی دووەم دێنێتەوە: وێنەی یەکەمیان حاڵەتی تاکیی مونافیقەکانی پێشان دەدات، بەلاّم لەم وێنەیەدا حاڵەتی گشتییان دەخاتە ڕوو، واتە: لە چ بارودۆخێکدان و واقیعەکەیان چۆنە؟! دەفەرموێ: ﴿ أَوْ كَصَيِّبٍ مِّنَ ٱلسَّمَآءِ فِيهِ ظُلُمَٰتٌ وَرَعْدٌ وَبَرْقٌ ﴾، واتە: وێنەی مونافیقەکان وەك كۆمەڵێك وایە، كە كەوتوونەتە نێو باران و هەورو ڕەهێڵەو هەورە تریشقەو برووسكەیەكەوە، لە شەوێكی تاریكی ئەنگوستەچاودا، جا بیهێنە بەرچاوی خۆت: كەسێك لە شەوێكی تاریكی ئەنگوستەچاوی پڕ سەرماو ڕەهێڵەو بە هەورە تریشقەو بروسكەدا گیری خواردبێ! ئنجا ﴿ يَجْعَلُونَ أَصَٰبِعَهُمْ فِىٓ ءَاذَانِهِم مِّنَ ٱلصَّوَٰعِقِ حَذَرَ ٱلْمَوْتِ ﴾، واتە: لە ترسی مردن پەنجەكانیان بخەنە گوێیانەوە لەبەر گرمەی هەورە تریشقەكان، چونكە وەك گوتمان (صاعِقة) بە دەنگی هەور دەگوترێ، جا جاری وایە ئاگری لەگەڵدایەو جاری وا هەیە دەبێتە هۆی ئازارو مردنیش، ﴿ وَٱللَّهُ مُحِيطٌۢ بِٱلْكَٰفِرِينَ ﴾، وە خوا كافرانی دەورە داوەو لێی دەرباز نابن، پاشان دەفەرموێ: ﴿ يَكَادُ ٱلْبَرْقُ يَخْطَفُ أَبْصَٰرَهُمْ ﴾، ئەوانە وەزعیان وایە، كە لەو شەوە تاریكەدا بروسكەی هەورە تریشقەكان هێندە بەهێزە، خەریكە چاویان كوێر بكا، وەك پێشتر گوتمان: ﴿ يَخْطَفُ ﴾، واتە: بیرفێنێ و بە خێرایی بیگرێ، بەلاّم لێرەدا مەبەست پێی كوێركردنە، وە لێرەدا ئەوە كە شیددەتی ڕووناكی بروسكەكە لە چاویان دەدات، بە جۆرێك لە دزین و ڕفاندنی داناوە، ﴿ كُلَّمَآ أَضَآءَ لَهُم مَّشَوْا۟ فِيهِ ﴾ هەر كاتێك كە هەورە تریشقە بروسكە دەدا، دەتوانن تۆزێ هەنگاو بنێن، تۆزێ دەڕۆن، ﴿ وَإِذَآ أَظْلَمَ عَلَيْهِمْ قَامُوا۟ ﴾، بەلاّم كاتێك كە تاریك دادێتەوە ڕادەوەستن، چونكە بەرپێی خۆیان نابینن، ﴿ وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ لَذَهَبَ بِسَمْعِهِمْ وَأَبْصَٰرِهِمْ ﴾، وە ئەگەر خوا ویستبای هەم دەنگی هەورە تریشقەكەی هەندە

بەهێز دەکرد، کە پەردەی گوێیـان بدڕێنیو، هەم تیشکەکەشی هەندە بەهێز دەکرد، کە چاوەکانیشیان کوێر بکات، ﴿إِنَّ اللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾، بێگومان خوا لەسەر هەموو شتێك بە توانایە.

هەڵبەتە وێنەی دووەم بۆ مونافیقەکان، توێژەرەوان زۆریان قسە لەسەر کردووە ئەوەی بە سەرنجدانی ئەو وێنەیە دێتە زەینەوە، ئەوەیە کە خوای کاربەجێ وێنەی مونافیقەکانی بە حاڵەتی کەسێك هێناوەتەوە، کە لە حاڵەتێکی ئاوادایە: کەسێك لە شەوێکی تاریکی ئەنگوستەچاودا، کە هیچ وەسیلەیەکی پێ نیە بەرپێی خۆی پێ ببینێ، غەیری تیشكو ڕۆشنایی برووسکە، وە گرمەی هەورو تاریکی شەوو بارانو ڕەهێڵەشی لەسەر کۆبۆتەوە، دیارە کەسێکی ئاوا لە وەزعێکی زۆر خراپدایە، جا مونافیقەکان لە کۆمەڵگەی ئیسلامییدا لە وەزعێکی ئاوادان.

## چەند مەسەلەیەکی گرنگ

**مەسەلەی یەکەم:** یەکێك بۆی هەیە بڵێ: باشە خوا ﷻ باسی کافران دەکات و دەفەرموێ: ئیمان ناهێنن، یەکسانە ئاگاداریان بکەیەوە یان نا، بیانترسێنی یان نەیانترسێنی، جا ئایا حیکمەتی ئەوە چییە؟ لەڕاستیدا حیکمەتەکەی ئەوەیە کە خوا (تبارك و تعالى) باسی حاڵەتی ئاسایی ئەهلی کوفر دەکات، کە ئەهلی کوفر حاڵەتی ئاسایی یان ئاوایە کە ئیمان ناهێنن، جا دوایی هەیە ئیمان دێنێ، مانا وایە لە حاڵەتی ئاسایی خۆی چۆتە دەر، وە بۆ ئەوەشە کە پێغەمبەر ﷺ وە هەر کەسێ کە بەرێی پێغەمبەردا دەڕوات، کاتێ کە دەبینێ ئەهلی کوفر زۆر کەللەڕەقنو ئیمان ناهێنن، زۆر تووشی دڵ ناڕەحەتیی نەبێو تووشی شپرزەیی نەبێو، بزانێ کە سوننەتی خوا ئاوایە کە ئەوانە ئیمان ناهێنن، وە وانەزانێ کە زەرەری لێدەکەوێ بەهۆی ئیمان نەهێنانی ئەوانەوە، واتە: ئەمە جۆرێکە لە دڵدانەوەی ئینسانی بانگخواز.

**مەسەلەی دووەم:** لەم ئایەتە بە پێزانەدا خوای کاربەجێو زانا دە (١٠) سیفەتی بنچینەیی مونافیقەکانی باسکردوون:-

سیفەتی یەکەم: بریتیە لە ئیددیعای ئیمانو دەڵێن: ئیمانمان هێناوە لە حاڵێکدا کە ئیمانیان نەهێناوە، ﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَقُولُ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَبِٱلْيَوْمِ ٱلْآخِرِ ... ﴿٨﴾ ﴾، ئەوە تایبەتمەندیترین سیفەتی مونافیقەکانە، چونکە مونافیق ئەگەر بڵێ کافرم مونافیق نیە، هەر بۆیەشە حاڵەتی (نیفاق) کاتێ پەیدادەبێ کە مسوڵمانان دەسەڵاتیان هەبێت، بەڵێ لەنێو کۆمەڵگای ئیسلامییداو لە شوێنێك کە مسوڵمانان دەسەڵاتیان هەبێت، (نیفاق) پەیدا دەبێت، چونکە کاتێ کە مسوڵمانان چەوساوە بن، کافرەکان ناچار نابن خۆ بە مسوڵمان پیشان بدەن، بۆیە لە (مەککە) حاڵەتی (نیفاق)مان نەبینیوەو، لە (مەدینە) مونافیق پەیدابوون، چونکە لە (مەدینە) ئیسلام دەسەڵاتی هەبوو.

سیفەتی دووەم: بریتیە لە خەڵك هەڵخەڵەتاندنو فریودان: ﴿ يُخَادِعُونَ ٱللَّهَ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ...﴿٩﴾ ﴾.

سیفەتی سێیەم: ئەوەیە کە دڵیان نەخۆشی گومانو دوودڵییو دڵەڕاوکەی تێدایە: ﴿ فِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ ...﴿١٠﴾ ﴾.

سیفەتی چوارەم: بریتیە لە درۆکردن: ﴿ ...بِمَا كَانُوا۟ يَكْذِبُونَ ﴿١٠﴾ ﴾.

سیفەتی پێنجەم: بریتیە لەوەی کە خۆیان بە چاکساز دەزانن: ﴿ ... قَالُوٓا۟ إِنَّمَا نَحْنُ مُصْلِحُونَ ﴿١١﴾ ﴾.

سیفەتی شەشەم: بریتیە لە بەکەم تەماشاکردنو بە بێعەقڵو نەفام تەماشاکردنی ئیمانداران، کە بە (سُفَهَاء) ناویان دەبەن: ﴿ قَالُوٓا۟ أَنُؤْمِنُ كَمَآ ءَامَنَ ٱلسُّفَهَآءُ ... ﴿١٣﴾ ﴾..

سیفەتی حەوتەم: دووڕوویی، کە لای ئەهلی ئیمان شتێك دەڵێنو لای ئەهلی کوفر شتێکی دیکە دەڵێن، کە پێچەوانەی ئەوەیە لای ئەهلی ئیمان

گوتوویانـــــە: ﴿ وَإِذَا لَقُوا۟ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ قَالُوٓا۟ ءَامَنَّا وَإِذَا خَلَوْا۟ إِلَىٰ شَيَـٰطِينِهِمْ قَالُوٓا۟ إِنَّا مَعَكُمْ ... ﴿١٤﴾ ﴾.

سیفەتی هەشتەم: لەبەر ئەوەی بۆخۆیان سووکن، گاڵتە بە خەڵك دەکەن: ﴿ ...إِنَّمَا نَحْنُ مُسْتَهْزِءُونَ ﴿١٤﴾ ﴾.

سیفەتی نۆیەم: هەست نەکردن: ﴿ ... وَلَـٰكِن لَّا يَشْعُرُونَ ﴿١٢﴾ ﴾.

سیفەتی دەیەم: بریتیە لەوەی کە ئەهلی زانیاریو لێکۆڵینەوە (علم و تحقیق) نین: ﴿ ...وَلَـٰكِن لَّا يَعْلَمُونَ ﴿١٣﴾ ﴾.

**مەسەلەی سێیەم:** لێرەدا خوای بێ وێنە باس لە موونافیقەکان دەکاتو دەفەرموێ: ﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَقُولُ ءَامَنَّا ﴾، واتە: لەنێو خەڵکیدا هەیە کەسانێك کە دەڵێ: ئیمانم هێنا.. ئەگەر ئیمان هێنان وەك بەداخەوە هەندێك لە زانایانی (عِلم الکَلام) گوتوویانە: (هەرکەسێك گوتی ئیمانم هێناو شایەتمانم هێنا، وە خۆی بە مسوڵمان پێشاندا، ئەوە بە ئیماندار لەقەڵەم دەدرێ)، بەڵێ ئەگەر ئەوەندە کافی بووایە، بۆ ئەوەی ئینسان بە ئیماندار لەقەڵەم بدرێ، خوا ﷻ نەیدەفەرموو: ﴿ وَمَا هُم بِمُؤْمِنِينَ ﴾، چونکە خۆ موونافیقەکان گوتوویانە: (آمنّا) ئیمانمان هێنا! کەواتە: گوتنی ئیمانو بیژتنی، یان دەربڕینی ئیمان، بە تەنیا ئیمان نیە، بەڵکو یەکێکە لە چوار پێکهێنەرەکانی ئیمان (وەك من لە کتێبی - ئیمانو عەقیدەی ئیسلامی - لە بەرگی یەکەم دا زۆر بە تەفصیلێ باسم کردوە) بەڵکو ئیمان چوار پێکهێنەری بنەڕەتی هەن، ئەوە زۆر گرنگە هەمووومان بیزانین، چونکە هەندێك کەس زۆرجار لە بە ئیماندار یاخود بەبێ ئیمان لەقەڵەمدانی خەڵکدا بەهەڵەدا دەچێ.

بەڵێ لە ئیسلامدا هەر کەسێ شایەتمانی هێناو خۆی بە مسوڵمان لەقەڵەمدا، بە مسوڵمان لەقەڵەم دەدرێ، بەڵام ئایا بە ئیماندار لەقەڵەم دەدرێت؟ هەڵبەتە نەخێر، چونکە: زۆر کەس مسوڵمان (مُسلِم)ە، بەڵام بڕوادار (مُؤمِن) نیە،

وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿قَالَتِ ٱلْأَعْرَابُ ءَامَنَّا ۖ قُل لَّمْ تُؤْمِنُوا۟ وَلَـٰكِن قُولُوٓا۟ أَسْلَمْنَا وَلَمَّا يَدْخُلِ ٱلْإِيمَـٰنُ فِى قُلُوبِكُمْ ﴿١٤﴾﴾ الحجرات، وەك دەبینین خوای پەنهانزان، ئیسلام لە عەرەبە خێڵەکییەکان دەسەلمێنێ، بەڵام ئیمانیان لێ ناسەلمێنێ! بەڵێ ئیمان چوار پێکهێنەری سەرەکی هەن و هەتا هەر چواریان نەبن، ئینسان بە ئیماندار لەقەڵەم نادرێ، کە بریتین لە:

یەکەم: دەرککردن و زانینی بە عەقڵ (الإدراك بالعَقل)، دەبێ ئینسان بە عەقڵ خوا بناسێ، وە پێغەمبەر ﷺ و ئەوەی خوا بە پێغەمبەردا ناردوویەتی، دەبێ بە عەقڵ بیناسێ و بیزانێ، چ بە کورتیی چ بە درێژیی (إجمالاً أو تفصيلاً).

دووەم: ئەوەی کە بە عەقڵ زانیویەتی بە دڵ قەبووڵی بکات و وەریبگرێ و خۆشیبوێ و پەسندی بێ (القبُولُ بالقَلْب والحبُّ والرِّضا).

سێیەم: بە زمان دانی پێدابنێ و دەریببڕێ (الإقرارُ باللِّسَان والتعبير عَنهُ).

چوارەم: بە جەستەو بە ئەندامەکانی جێبەجێی بکات (العَمَلُ والتَّنفيذ بالجَوارِح)، بەڵێ بەڕێزان! دەبێ ئەم چوار پێکهێنەرە هەبن، ئەمجار ئیمان دێتە دی، دیارە ئەوەی کە زۆر بنەڕەتییە لە ئیماندا زانینە، لەگەڵ قەبووڵکردنی نێو دڵ، کە هەردووکیان پەیوەندییان بە عەقڵ و دڵەوە هەیە، بۆیە خوا ﷻ کە باسی ئیمان دەکات بەزۆری باسی (قَلْب) دەکات، بۆ نموونە: دەفەرموێ: ﴿أُو۟لَـٰٓئِكَ كَتَبَ فِى قُلُوبِهِمُ ٱلْإِيمَـٰنَ وَأَيَّدَهُم بِرُوحٍ مِّنْهُ ﴿٢٢﴾﴾ المجادلة، ﴿وَلَمَّا يَدْخُلِ ٱلْإِيمَـٰنُ فِى قُلُوبِكُمْ ﴿١٤﴾﴾ الحجرات، چونکە بەشی سەرەکی و بەشی هەرە گەورەی ئیمان پەیوەندی بە دڵەوە هەیە، بەڵام لەڕاستیدا ئیمان تەنیا لەدڵدا کورت هەڵاتوو (حَصْر) نیە، بەڵکو وێڕای عەقڵ و دڵ، دەبێت دانپێداهێنانی زمان، وە جێبەجێ کردنی ئەندامەکانیش هەبن.

بۆ زیاتر ڕوونکردنەوەی مەبەست دەڵێین: ئینسان چوار هێزی سەرەکی هەن، کە بریتین:

١/ هێزێك کە شتی پێ دەزانیو دەرك دەکات، کە عەقڵە.

٢/ هێزێك کە شتی پێ ڕەفزو قەبووڵ دەکات، کە دڵە.

٣/ هێزێك کە شتی پێ دەردەبڕێ، کە زمانە.

٤/ هێزێك کە شتی پێ ئەنجام دەدات، کە جەستەیە.

ئیمانیش کە چوار پێکهێنەری بنەڕەتی هەن، هەرکامێکیان پەیوەستە بە یەکێك لەو چوار هێزەوە، کەواتە: ئیمان بە ئیمان دانانرێ تاکو مرۆڤ بە هەموو گیانیو بە هەر چوار هێزەکەیەوە تەفاعولی لەگەڵ نەکات.

**مەسەلەی چوارەم:** وێنە هێنانەوە شتێکی زۆر گرنگە، بۆیەش وێنە هێنانەوە لە قورئادا زۆر گرنگی پێدراوە، وێنە هێنانەوە یانی چی؟ واتە بەرجەستەکردنی مانا لە قاڵبی ماددیدا زانایان وایان تەعبیر لێکردوە دەڵێن: (تَقرِيبُ المعاني المعقولة بِتَجْسِيدها في صورٍ مَحْسُوسة) واتە: مەبەستە مەعنەوییە مەعقووڵەکان بێنی بەرجەستە بکەی لە وێنە بەرهەستەکاندا، ئنجا ئایا ئەوە بۆچی گرنگە؟ چونکە کاتێك کە شتێك بەرجەستە دەکرێ لە وێنەیەکی ماددییدا، تۆ بە خەیاڵ بەچاو تەماشای دەکەی، وە بە خەیاڵ بە گوێ دەنگی دەبیستیو تێوەی ڕادەمێنی، ئەوەش زۆر یارمەتیت دەدات، کە تۆ باشتر لێی حاڵیبی. لەوەی کە تەنیا بە شێوەیەکی تیۆریی (نظري) و فیکریی (عقلي) لێی وردبیەوە. بۆ وێنە: کاتێ خوا ﷻ باسی قورئانەکەی خۆی دەکاتو بە ڕووناکی ناوی دەباتو بە ڕۆشناییەك کە بەرچاوی ئینسان ڕۆشن دەکاتەوە، وەك لە سوورەتی (الأنعام)دا فەرموویەتی: ﴿ أَوَمَن كَانَ مَيْتًا فَأَحْيَيْنَٰهُ وَجَعَلْنَا لَهُۥ نُورًا يَمْشِي بِهِۦ فِي ٱلنَّاسِ كَمَن مَّثَلُهُۥ فِي ٱلظُّلُمَٰتِ لَيْسَ بِخَارِجٍ مِّنْهَا ۚ كَذَٰلِكَ زُيِّنَ لِلْكَٰفِرِينَ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿١٢٢﴾ ﴾ الأنعام، واتە: ئایا وێنەی کەسێك کە مردوو بوو زیندوومان کردۆتەوە، وە ڕۆشناییەکمان پێداوە کە لەنێو خەڵکی پێی دەڕواو

بەرپێی خۆی پێ دەبینێ، وەك كەسێك وایە لەنێو تاریكاییەكاندایەو لێیان دەرباز نابێ؟! ئاوا كردەوەكانیان بۆ كافران ڕازێنراونەوە، واتە ئایا ئینسانی ئیماندار وەك ئینسانی كافر وایە؟ بەڵام خوای پەروەردگار ئینسانی ئیماندار بە كەسێكی زیندوو كە ڕووحێكی هاتۆتە بەدەنەوەو ڕۆشناییەكی پێدراوەو حەرەكەی پێدەكات، لەوەدا بەرجەستەی دەكات، وە وێنەی كافریش كەسێكە كەوتۆتە نێو كۆمەڵێك تاریكایی‌و دەخولێتەوەو سەردەر ناكات! بە دڵنیاییی ئێمە بە هۆی ئەو وێنە هێنانەوەوە باشتر لە مانای ئیمان‌و كوفر حاڵی دەبین.

**مەسەلەی پێنجەم:** حاڵی بوون لە وێنە هێنانەوەكان (أمثال)ی قورئان، خوا ﷻ تایبەتی كردوە بە ئەهلی عیلمەوە، وەك لە سووڕەتی (العنكبوت)دا فەرموویەتی: ﴿ وَتِلْكَ ٱلْأَمْثَـٰلُ نَضْرِبُهَا لِلنَّاسِ ۖ وَمَا يَعْقِلُهَآ إِلَّا ٱلْعَـٰلِمُونَ ﴿٤٣﴾ ﴾العنكبوت، واتە: ئەو وێنانە بۆ خەڵكی دەهێنینەوە، وە تەنیا زانایان تێیان دەگەن. دیارە لێرەدا مەبەست ئەوەیە ئینسان بەبێ زانیاری، وە لەپێش ئەوەشدا بەبێ هەبوونی عەقڵ لە وێنەكانی قورئان تێناگات، وە ئینسان تا عیلمی زیاتربێ‌و عەقڵی وردترو تیژتر بێت چاكتر لە وێنەكان حاڵی دەبێت.

**مەسەلەی شەشەم:** جێی سەرنجیش ئەوەیە، كە خوا ﷻ بە زۆری وێنە لە قورئاندا دێنێتەوە بۆ بابەتی گرنگ‌و گەورە، بۆ وێنە دەفەرموێ: ﴿ أَلَمْ تَرَ كَيْفَ ضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا كَلِمَةً طَيِّبَةً كَشَجَرَةٍ طَيِّبَةٍ أَصْلُهَا ثَابِتٌ وَفَرْعُهَا فِى ٱلسَّمَآءِ ﴿٢٣﴾ ﴾إبراهيم، لێرەدا خوای كاربەجێ وێنە دێنێتەوە بە درەختێكی پاك‌و چاك بەردار، لق‌و پۆپ بەرز، هەڵچوو، ڕیشە داكوتراو لە زەویدا، هەمیشە میوەو بەر دەردەكات، بۆ خوا بەیەكگرتن (التوحید)و، وشەی (لا إله إلا الله)، هەروەها ئەگەر تەماشای وێنەكانی دیكەی قورئان بكەین بەزۆری هەروان، بۆ وێنە لە سووڕەتی (العنكبوت) لە ئایەتی (٤١)دا دەفەرموێ: ﴿ مَثَلُ ٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُوا۟ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَوْلِيَآءَ كَمَثَلِ ٱلْعَنكَبُوتِ ٱتَّخَذَتْ بَيْتًا ۖ وَإِنَّ أَوْهَنَ ٱلْبُيُوتِ لَبَيْتُ ٱلْعَنكَبُوتِ ۖ لَوْ كَانُوا۟ يَعْلَمُونَ ﴾، واتە: وێنەی ئەوانەی، كە

جگە لە خوا دەكەن بە دۆستو پشتیوانی خۆیان، وەك جاڵجاڵۆكەیەك وایە كە خانوویەك دروست دەكات، وە ئەگەر بزانن بێهێزترین ماڵیش ماڵی جاڵجاڵۆكەیەكە.

**مەسەلەی حەوتەم:** دەغەڵیو دووڕوویی (نیفاق) پیسترین جۆری كوفرە، خوای دادگەر لە سوورەتی (النساء)دا زۆر بە ڕاشكاویی فەرموویەتی: ﴿ إِنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ فِى ٱلدَّرْكِ ٱلْأَسْفَلِ مِنَ ٱلنَّارِ وَلَن تَجِدَ لَهُمْ نَصِيرًا ﴿١٤٥﴾ ﴾، واتە: بێگومان مونافیقەكان لە پلەی خوارەوەی ئاگردان، وە هیچ یاریدەدەریشت بۆیان چنگ ناكەوێ، وشەی (دَرکَة) بە (دَرَكَات) كۆدەكرێتەوەو پێچەوانەی وشەی (دَرجة)یە كە بە (دَرَجَات) كۆ دەكرێتەوە. (دَرَجَات) ئەوەیە كە تۆ لە ئاستی خۆتەوە بەرەو سەرەوە بڕۆیو، (دَرَكَات)یش ئەوەیە كە لە ئاستی خۆتەوە بەرەو خوار بڕۆی، ئنجا كە خوا دەفەرموێ: مونافیقەكان لە پلەی خواری خوارەوەی دۆزەخدان، دیارە دەبێت لە هەموو كافرەكان خراپتر بن بۆیە لە خوار هەموو كافرانەوەن، چونكە خوا ﷻ سزای خەڵك پڕ بە پێستو عادیلانە دەداتو، كەسێك خراپترینو توندترین سزای هەیە، كە لە هەموو كەس خراپتربێ، كەواتە: دیارە مونافیقەكان لە هەموو كافران خراپترن بۆیە لە خوار هەموو كافرانەوەن لە سزادا، بەڵگەیەكی دیكە ئەوەیە كە لە سوورەتی (النساء) لە ئایەتی (١٤٦)دا، هەر لەدوای ئەو ئایەتەی كە باسمان كرد، خوا باسی تۆبەی مونافیقەكان دەكات كە چۆن قەبووڵ دەكریو دەفەرموێ: ﴿ إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُوا۟ وَأَصْلَحُوا۟ وَٱعْتَصَمُوا۟ بِٱللَّهِ وَأَخْلَصُوا۟ دِينَهُمْ لِلَّهِ فَأُو۟لَٰٓئِكَ مَعَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ۖ وَسَوْفَ يُؤْتِ ٱللَّهُ ٱلْمُؤْمِنِينَ أَجْرًا عَظِيمًا ﴿١٤٦﴾ ﴾النساء، واتە: مونافیقەكان ئەوە سەرەنجامو سزایانە، جگە لەوانەی كە دەگەڕێنەوە بۆ لای خوا، ئنجا چوار مەرجی بۆ وەرگرتنی تۆبەی بابای مونافیق داناون، چونكە مونافیق كوفرەكەی كوفرێكی ئاوێتە (مركب)یە، بۆیە دەبێت گەڕانەوەشی بۆ لای خوا گەڕانەوەیەكی ئاوێتەبێ، كەسێك كە تووشی نەخۆشییەكی سادە دەبێت،

دەرمانێکی سادەی بەسە، بەڵام کەسێك تووشی نەخۆشییەکی قورسی لێکدراو بووبێت، دیارە هەتا نەخۆشییەکەی قورستربێ، پێویستی بە چارەسەری جۆراوجۆرترو زیاتریش دەکات.

**مەرجەکانی وەرگرتنی گەڕانەوە (توبة)ی مونافیقانیش، ئەم چوارەن:**

**یەکەمیان/** دەفەرموێ: ﴿ ٱلَّذِينَ تَابُوا۟ ﴾، ئەوانەی کە دەگەڕێنەوە، واتە: تا ئێستا مونافیق بوونو ئەهلی کوفر بوون، لەمەودوا ببن بە ئەهلی ئیمان.

**دووەمیان/** دەفەرموێ: ﴿ وَأَصْلَحُوا۟ ﴾، وە چاکسازیی یان کردوە، واتە: ئەگەر هەتا ئێستا سەرگەرمی خراپەکاریی بوون، لەمەودوا چاکەو چاکەکاریی دەکەنە پیشە.

**سێیەمیان/** دەفەرموێ: ﴿ وَٱعْتَصَمُوا۟ بِٱللَّهِ ﴾، لەمەودوا پەنا بە خوا بگرن، چونکە مونافیقەکان بەزۆری بەوە دەبنە مونافیق، کە لە جیاتی خواو پاشان ئەهلی ئیمان، ئەهلی کوفر دەکەن بە دۆستو پشتیوانی خۆیان، بە زۆری نیفاق بە هۆی ئەوەوە پەیدا دەبێ.

**چوارەمیان/** دەفەرموێ: ﴿ وَأَخْلَصُوا۟ دِينَهُمْ لِلَّهِ ﴾، گەردن کەچیی خۆیان بۆ خوا ساغ بکەنەوە، واتە: تا ئێستا طاعەتەکەیان خلّتەو خالّی پێوە بووە، نوێژیان بە ڕیاو درۆ کردوەو، طاعەتی دیکەشیان کردوە، ئەمما ساغو ڕاست نەبووە، بەڵام لەمەودوا بەندایەتییەك ئەنجام بدەن، کە خلّتەو خالّی پێوەنەبێ.

ئنجا پاش ئەو گەڕانەوە چوار مەرجییە، دەفەرموێ: ﴿ فَأُو۟لَـٰٓئِكَ مَعَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴾، ئا ئەوانە لەگەڵ ئیمانداران.

**مەسەلەی هەشتەم:** پێویستە بزانین (نیفاق) تەنیا یەك جۆر نییە، بەڵکو (نیفاق)ی گەورە هەیەو (نیفاق)ی گچکەش هەیە، کە هەندێك لە زانایان بە (النفاق الإعتقادي و النفاق العملي) تەعبیریان لێ کردوون، (نیفاق)ی گەورە

ئەوەیە كە ئینسان لە دەروونەوە كوفری هەبێ وە ئیمانی نەبێ، بەڵام بەدرۆ خۆی بە مسوڵمان پیشاندا، (نیفاق)ی گچكەش ئەوەیە كە ئینسان هەندێك لە سیفەتەكانی مونافیقەكانی تێدا هاتبنە دی، پێغەمبەر ﷺ یش چەند فەرموودەیەكی هەن لەوبارەوە، بۆ نموونە: فەرموودەیەكی پێغەمبەر ﷺ كە (بخاري‌و مسلم) دەیگێڕنەوە لە (عەبدوڵڵای كوڕی عەمری كوڕی عاص)ەوە كە فەرموویەتی: {(أَرْبَعٌ مَنْ كُنَّ فِيهِ كَانَ مُنَافِقاً خَالِصاً، وَمَنْ كَانَتْ فِيهِ خَصْلَةٌ مِنْهُنَّ كَانَتْ فِيهِ خَصْلَةٌ مِنَ النِّفَاقِ حَتَّى يَدَعَهَا: إِذَا اؤْتُمِنَ خَانَ، وَإِذَا حَدَّثَ كَذَبَ، وَإِذَا عَاهَدَ غَدَرَ، وَإِذَا خَاصَمَ فَجَرَ) (رَوَاهُ الْبُخَارِيُّ بِرقم: (٣٤)، وَمُسْلِمٌ بِرقم: (٢٠٧)، وَالتِّرمِذِيّ بِرقم: (٢٦٣٢)، وَالنَّسَائِيُّ بِرقم: (٥٠٣٥)}، واتە: چوار سیفەت لە هەركەسێكدا هەبن، ئەوە مونافیقێكی ڕووتە (مونافیقێكی تەواو عەیارە) وە هەركەسێك یەكێ لەو چوار سیفەتەی تێدا هەبێ، ئەوە یەكێك لە سیفاتەكانی نیفاقی تێدایە، تاكو دەستی لێ هەڵدەگرێ:

**یەكەم/** ئەوەیە كە هەر كاتێ بە ئەمیندار دانرا، خیانەت بكات، (واتە خیانەت لە ئەمانەت بكا).

**دووەم/** هەمیشە لەكاتی قسەكردندا درۆ بكات.

**سێیەم/** هەردەم لەكاتی پەیماندان غەدر بكات، (غەدر، واتە: پەیمان شكاندن)، لە كوردەواریی خۆماندا غەدر بە مانای زوڵم دێت، بەڵام لە زمانی عارەبیدا وە لە بەكارهێنانی قورئان‌و سوننەتدا غەدر بە مانای پەیمان شكاندن دێت).

**چوارەم/** هەركاتێ دەمەقاڵێ‌و مشتومڕی بوو لەگەڵ كەسێكدا، خۆی تووشی گوناح‌و تاوان بكات (سوێندی بەدرۆ بخوات، غەیبەتی كابرا بكات، بوختانی پێ بكات... بەو شێوەیە)، جا ئایا كەسێك هەركام لەو چوارانەی تێدا بن، مانای وایە ئەوە (نیفاق)ی گەورەی تێدا هاتۆتەدی؟ دیارە هەندێك لە زانایان دەڵێن: نا، چونكە لێرەدا مەبەستی پێغەمبەر ﷺ كە دەفەرموێ: (مُنَافِقاً خَالِصاً)، واتە (نیفاق)ی گچكەی بە تەواوی تیادا هاتۆتە دی، چونكە (نیفاق)ی گچكەش بەش بەشە، منیش وای تێدەگەم كە ئینسان مەگەر

ببێتە مونافیقێکی تەواو عەیار، واتە: بە مانای (نیفاق)ی گەورە، ئەگەرنا ئەو هەموو سیفەتە نزمانەی تێدا نایەنەدی، چونکە حەدیسەکە دەفەرموێ: هەر کاتێك کە ئەمانەتی پێ سپێردرا خیانەتی لێ بکات، واتە: پیشەی خیانەتکردن بێ بە ئەمانەت، وە پیشەی درۆکردن بێت لە قسەکردندا، وە پیشەی پەیمانشکاندن بێت، وە پیشەی گوناهکردن (فجُور) کردن بێت لە دەمەقاڵێیدا، هەرکاتێ ئینسان ئەو چوار سیفەتەی تێدا بوونە عادەتو پیشە، ئەوە بەدڵنیاییەوە، دیارە ئیمانی لەدڵدا نیە، بەڵێ دەگونجێ مسوڵمان جارێ خیانەتێ بکا، جارێ درۆ وەعدە خیلافی ببێ، جارێك لە دەمەقاڵێیدا تووشی گوناهبێ، بەڵام ناگونجێ ئەوانەی تێدا ببنە عادەت، چونکە فەرموودەکە ئاماژە بەوە دەکات، کە هەر کاتێ قسەی کرد درۆ دەکات، هەر کاتێ ئەمانەتی پێدرا خیانەتی پێ دەکات ... هتد، واتە: ئەو سیفەتانەی تێدا ڕیشەدار بوون، دیارە ئەگەر ئەسڵی ئیمانو تەوحیدی لە دڵدا هەبێ، ئەو سیفەتە خراپانە ئاوا تێیدا نابنە عادەتو خەسڵەتی ڕیشەدار. خوا بە لوتفو کەرەمی خۆی هەموو لایەکمان لە (نیفاق)ی گەورەو گچکە بپارێزێو بمانپارێزێنێتەوە بە ئیمانو تەوحیدی ڕاستەقینە.

سُبْحَانَكَ اللّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی پێنجەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان لە ئایەتی (٢١ تا ٢٤) لە سووڕەتی بەقەڕە دەگرێتە خۆیو لەم چوار ئایەتەدا دوو بابەتی گرنگ باسكراون:

بابەتی یەكەمیان: ئەوەیە كە خوا ﷻ بانگی مرۆڤایەتی دەكات بە گشتی بۆ بەندایەتییكردن بۆ خۆی، وە پاشان بەرهەمی بەندایەتییكردن بۆخۆی دەخاتە ڕوو، دوایی بەڵگەو پاساوی بەندایەتییكردن بۆخۆی باس دەكات، كە بۆچی دەبێت بەندەكان تەنیا خوای خۆیان بپەرستنو تەنیا ئەو بە پەرستراوو پەروەردگاری خۆیان بزانن؟

بابەتی دووەمیان: ئەوەیە كە خوای زاناو شارەزا بانگی خەڵكی دەكاتو پێیان دەفەرمویٚ: ئەگەر لە گوماندان لەوەی كە بۆ بەندەی خۆم كە موحەممەدە ﷺ ناردوومە (كە مەبەست پێی قورئانە)، ئەوە فەرموون ئێوەش وێنەی سووڕەتێكی قورئان بێنن، واتە: بانگی مرۆڤایەتی دەكات بۆ ئیمان هێنان بە قورئان، لەسەر بناغەی ئەوە كە قورئان بەرنامەی موحەممەدە ﷺ وە لە هەمان كاتیشدا بەڵگەو موعجیزەی پێغەمبەرایەتی موحەممەدە ﷺ.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱعْبُدُوا۟ رَبَّكُمُ ٱلَّذِى خَلَقَكُمْ وَٱلَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ﴿٢١﴾ ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُمُ ٱلْأَرْضَ فِرَٰشًا وَٱلسَّمَآءَ بِنَآءً وَأَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَأَخْرَجَ بِهِۦ مِنَ ٱلثَّمَرَٰتِ رِزْقًا لَّكُمْ ۖ فَلَا تَجْعَلُوا۟ لِلَّهِ أَندَادًا وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿٢٢﴾ وَإِن كُنتُمْ فِى رَيْبٍ مِّمَّا نَزَّلْنَا عَلَىٰ عَبْدِنَا فَأْتُوا۟ بِسُورَةٍ مِّن مِّثْلِهِۦ وَٱدْعُوا۟ شُهَدَآءَكُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٢٣﴾ فَإِن لَّمْ تَفْعَلُوا۟ وَلَن تَفْعَلُوا۟ فَٱتَّقُوا۟ ٱلنَّارَ ٱلَّتِى وَقُودُهَا ٱلنَّاسُ وَٱلْحِجَارَةُ ۖ أُعِدَّتْ لِلْكَٰفِرِينَ ﴿٢٤﴾ ﴾

## مانـــای وشـــە بە وشـــەی ئایەتەكـــان

((ئـەی خەڵـكینە ئـەو پـەروەردگارەتان بپەرسـتن كـە ئێـوەش‌و ئەوانـەی پـێش ئێوەشی دروسـتكردوە، بەڵكو خۆتان بپارێزن (لـە تـووڕەیی‌و سـزای خـوا) ﴿٢١﴾ ئـەو كەسـەی كـە زەوی بۆتــان ڕاخـستوە، وە ئاسمـانی بـۆ كردوونـە سـەربان، وە لــە سەرووتانەوە ئاوی ناردۆتە خواریێ‌و میوەجاتی پێ دەرهێناوە، كە بژێوی ئێوە بێت، دەجا هاوەڵان بۆ خوا دامەنێن لە حاڵێكدا، كە دەزانن هاوەڵی نین ﴿٢٢﴾ وە ئەگەر لـە دوودڵیی دابوون لەبارەی ئەوەوە كـە ناردوومانەتـە سـەر بەندەكـەمان (موحەممـەد ﷺ) ئەوە سووڕەتێكی وەك وی بێنن، وە جگە لـە خـواش سـەرجەم شاهیدەكانتان (هاوكارەكانتــان) بـانگ بكـەن، ئەگـەر ڕاسـت دەكـەن ﴿٢٣﴾ بـەڵام ئەگـەر ئـەوەتان نەكردو هەرگیزیش بـۆتان ناكرێ، ئەوە بەهۆی ئیمان هێنانەوە، خۆتـان لـەو ئـاگرە بپارێزن، كە سووتەمەنییەكەی خەڵك‌و بەردە، بۆ كـافران دانراوە ﴿٢٤﴾)).

## شیكردنەوەی هەندێك لە وشـــەكان

(تَتَّقُونَ): وشەی (تَقوَی) لـە ئەسـڵـدا لـە (وِقَایَة)ەوە هـاتوە، واتـە: پارێـزكـردن، خـوا ﷻ جاری وا هەیـە تـەقوای پاڵداوەتـە لای خـۆی‌و جـاری وا هەیـە پـاڵی داوەتــە لای غـەیری خـۆی، بـۆ وێنـە لێـرەدا دەفـەرموێ: ﴿ فَٱتَّقُواْ ٱلنَّارَ ٱلَّتِي وَقُودُهَا ٱلنَّاسُ وَٱلۡحِجَارَةُۖ أُعِدَّتۡ لِلۡكَٰفِرِينَ ﴿٢٤﴾ ﴾البقـرة، واتـە: خۆتـان بپـارێزن لـە ئاگرێك كە سووتەمەنییەكەی خەڵـك‌و بەردە، كە بۆ كافران ئامـادەكراوە وە لـە سـەرەتای سـووڕەتی (النـسـاء)دا فەرموویـەتی: ﴿ ... وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِي تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلۡأَرۡحَامَ ... ﴿١﴾ ﴾، واتە: خۆتان لەو خوایە بپارێزن كـە شـتی پـێ لـە یەكدی داوا دەكـەن، وە خۆشـتان لــە ڕەحمــەكان (پەیوەنـدیی خزمایـەتی) بپــارێزن، كەواتە: ئەسڵی وشـەی (تَقوَی) لە ڕیشـە زمانەوانییەكەیـدا دەگەڕێتـەوە سـەر

(وِقاية)، واتە: پارێزکردن، ئنجا خۆ لە خوا پاراستن ئەوەیە، کە تۆ خۆ بپارێزی نەوەك خوا لێت تووڕە بێت، خوای پەروەردگار بەچی تووڕە دەبێ؟! پێشتر باسمان کرد، کە خوای بەرزو مەزن بە گشتی بە دوو شتان تووڕە دەبێت: ئەوەی کە لەسەری پێویست کردووی بیچوێنی، یان ئەوەی لێی قەدەغە کردووی بیشکێنی، بۆیە زانایان گوتوویانە: (التَّقْوَى: جماع خِصَال الخَيْر كُلّها)، واتە: پارێزکاریی هەرچی سیفاتی چاکە هەمووی کۆدەکاتەوە، چونکە تۆ ئەگەر هەرچی خوا پێی خۆشە، ئەنجامت دا بەپێی توانا، وە هەرچی خوا پێی ناخۆشە، خۆت لێ دوور گرت، مانا وایە تۆ هەموو شەریعەتت جێبەجێ کردوە!

(خَلَقَكُمْ): (الخَلْقُ: التَّقْدِيرُ المُسْتَقِيمِ، وَيُسْتَعْمَلُ فِي إِبْدَاعِ الشَّيْءِ مِن غَيرِ أصْلٍ وَلا احْتِذَاءٍ) وشەی (خَلْقُ) بریتیە لە ئەندازەگیریی ڕاستو دروست، وە بەکاردێ بۆ هێنانەدی شتێك لە نەبوونەوە، کە دیارە تەنیا خوا بەدیهێنەر (خالِقْ)ە، بەم مەفهوومەیان، بەڵام (خلق) مەفهوومێکی دیکەشی هەیە، کە بریتیە لە گۆڕینی شتێك لە حاڵەتێکەوە بۆ حاڵەتێکی دی، بۆیە ئەوە پاڵدراوەتە لای عیسا ﷺ وەك دەفەرموێ: ﴿...أَنِّيٓ أَخۡلُقُ لَكُم مِّنَ ٱلطِّينِ كَهَيۡـَٔةِ ٱلطَّيۡرِ فَأَنفُخُ فِيهِ فَيَكُونُ طَيۡرَۢا بِإِذۡنِ ٱللَّهِۖ...﴿٤٩﴾﴾ آل عمران، واتە: من لە قوڕ شێوەی باڵندەتان بۆ دروست دەکەم، وە فووی پێدا دەکەمو دەبێ بە باڵندە بە مۆڵەتی خوا.

(لَعَلَّكُمْ): وشەی (لَعَلَّ: طَمَعٌ وإشْفَاقٌ)، واتە: ئومێدەواریی یە بە بوونی شتێكو ترسانیشە لە نەبوونی، جا دیارە ئەوە بە نیسبەت خوای بێ وێنەوە گونجاو نیەو نابێ، بۆیە هەندێك لە توێژەرەوان گوتوویانە: (لَعَلَّ: مِنَ اللهِ وَاجِبَةٌ) وتە: هەرکاتێ خوا فەرمووی (لَعَلَّ) ئەوەتان بۆ بکەم، مانای وایە ئەو شتە خوا لەسەر خۆی واجبی کردوە کە بیکات، یان ئێوە وابکەن، ئومێد وایە ئەو شتەتان بۆ بکرێ، ئومێد وایە کە ئەنجامەکەی وابێ.

(**فِرَٰشًا**): (الفَرْشُ: بَسْطُ الثِّيَابِ، وَيُقَالُ لِلمَفْرُوشِ: فَرْشٌ وفِرَاشٌ، وَجَمعُ فِرَاشٍ: فُرُشٌ) واتە: پۆشاکێك بڵاوبکەیەوە، پێی دەگوترێ (فَرْشُ) (هەروەها بە ڕایەخیش دەگوترێ)، وە (فرش)و (فِرَاشٍ) کۆیەکەی (فُرُشٌ)ە، کە دەفەرموێ: خوا زەوی بۆ کردوون بە (فِرَاشٍ) ، واتە: زەوی بۆ کردوون بە ڕایەخێك و بۆی ڕاخستوون، یاخود زەوی بۆ پان ڕاخستوون.

(**بِنَآءً**): (والبِنَاءُ: إِسمٌ لما يُبنَى بنَاءً)، وشەی (بِنَاءً) ناوە بۆ هەر شتێك کە بینای بکەی، وە لێرەدا مەبەست پێی سەربان و سەقفە.

(**أَندَادًا**): کۆی (نِدّ)ە، (نِدُّ الشَّيءِ مُشَارِكُهُ فِي جَوْهَرِهِ، فإنَّ المِثْلَ يُقالُ في أي مشَارَكة كَانَت، فكُلُّ نِدٍّ مِثْلٌ ولا عَكْس) واتە: (نِدّ)ی هەر شتێك، هاوبەشیەتی لە ماهیەت و لە نێوەڕۆکیدا، بەڵام (مثل) وانیە، (مثل) ئەوەیە کە لە هەندێ شت وێی بچێ، یاخود جاری وا هەیە لێی نزیکە، بەڵام (نِدّ) ئەوەیە کە لە جەوهەرەکەیدا بەشداربێ، بۆیە هەموو (نِدّ)ێك (مثل)یشە، بەڵام هەموو (مثل)ێك (نِدّ) نیە.

(**شُهَدَآءَكُم**): (شُهَدَاءَكُم: أعوانكُم أو الذينَ يَشهَدُونَ لَكُم، أو الذينَ يُعتَدُّ بحضُورِهِم)، واتە: هاوکارەکانتان، یان ئەوانەی شاهێدییتان بۆ دەدەن، یان ئەوانەی کە بایەخ بە ئامادەبوونیان دەدرێ، بەڵام لێرەدا مەبەست پێی هاوکارانە، چونکە (شُهَدَاءَ) کۆی (شَهِيدَ)ەو بە مانای شایەدو هاوکاریش دێت.

(**أُعِدَّتْ**): (الإعدَادُ مِنَ العَدِّ كالإسقَاءِ مِنَ السَّقي، فإذَا قِيلَ أعْدَدْتُ هَذَا لَكَ: أي جَعَلْتُهُ بحَيث تَعُدُّهُ وتتناولهُ بِحَسَب حَاجَتَك إليهِ) وشەی (إعدَاد)، واتە: ئامادەکردن، (أُعِدَّتْ)، واتە: ئامادەکراوە، چونکە شتی ئامادەکراو دەگونجێ بژمێردرێ، یان دەستی بدرێتێ.

## مانـــای گشـــتی ئایەتەکـــان

خـوا ﷻ دوای ئـەوەی باسـی کۆمـەڵگـای ئیـسلامیی کـرا، وە باسـی هـەر سـێ پێکهێنـەرەکانی کـرا، کـە: پارێزکـارانن‌و، کـافرانێکن کـە ئیمانیـان نـەهێناوە بـە ئیسلام‌و خۆیـان بـە ئاشکرا بـە کـافر نیـشـاندەدەن، کـە لـە کۆمـەڵگای ئیـسلامیی یەکەمـدا هـەبوون، وە مونـافیقـەکانن کـە کەسـانێکن بێبـڕوان، بـەڵام خۆیـان بـە مـسوڵمان نیـشـاندەدەن، وە هەمیـشە کۆمـەڵگای ئیـسلامیی ئـەم سـێ پێکهێنـەرەی هەن، وە لێرەدا ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت، کە هەموو جۆرە کـافرەکان بۆیـان هەیـە لە سایەی دەوڵـەتی ئیـسلامییدا بژین، واتـە خـەڵك ناچار نـاکرێ ببنـە مونـافیق، ئەوانەی خۆیان ئەو ڕێیە هەڵدەبژێرن، ئـەوە مەسـەلەیەکی دیکەیـە، ئەگـەرنا خـوا ڕێگـا دەدا مرۆڤـ کـافربێ، هـەروەك لـە سـووڕەتی (الكهـف) ئایـەتی (٢٩)دا فەرموویـەتی: ﴿ ... فَمَن شَآءَ فَلْيُؤْمِن وَمَن شَآءَ فَلْيَكْفُرْ ... ﴾، ئنجا ئـەو کەسـەش کە پێی وایە لە دەوڵەتی ئیسلامییداو لە کۆمـەڵگای ئیسلامییدا ڕێگا نادرێ کە مرۆڤـ ئیعلانی کوفری خۆی بکات، مانـای وایـە قەناعـەتی وای لـێدێ کـە ئیـسلام خـەڵك ناچار دەکات ببێتە مونافیق، وە بە دڵنیاییش هەمیشە مونافیق لـە کـافرخراپتـرە ! دیـارە ئـەوەش پێـچەوانەی حیکمـەتی خوایـەو پێـچەوانەی بـەزەیی خواشـە، کـە شـەریعەتەکەی خەڵك ناچار بکات ببنە مونافیق، چونکە کـاتێ کە ڕێگا لـە خـەڵك گـیرا بەئاشـکرا کافربـێ، مانـای وایـە ناچـارکراون مونـافیق بـن، دیـارە ئـەوەش لـە کاتێکدایـە ئیـسلام دەسـەڵاتی هەیـە، مەبەستیـشم لـە کافـر تـەنیا نەصـڕانیی‌و جوولەکـە نیـە، چـونکە ئـەوە دیـارە جوولەکـەو نەصـڕانیی لـە سـایەی دەوڵـەتی ئیسلامییدا ژیـاون، بـەڵکو مەبەسـتم هـەموو جۆرەکانی ئـەهلی کوفرە، هـەموویان بۆیان هەیە لەژێر سایەی دەوڵەتی ئیسـلامییدا بژیەن، وە ئەو ڕایـەش بـەهێزترین ڕای زانـایانە کە سەرانە (جزية) لە هەموو جۆرەکانی ئەهلی کوفر وەردەگیـرێ،[1]

---

١) بـەڵام وەرگرتنـی سـەرانە (جزیـة)ش هەلومـەرجی تایبـەتی خـۆی هەیـەو مـەرج نیـە هـەموو هاووڵاتیەکی ناموسڵمانی ژێر سایەی دەوڵەتی ئیسلامیی سەرانەی لێ وەردەگیرێ، هەروەها بناغـەی هاوپەیمانێتی نێوان دەوڵەت‌و کۆمەڵگای ئیسلامیی‌و هاووڵاتیانی نامسوڵمان، هەمیشە پەکی لەسەر

وەك من لە كتێبی (چەند مەسەلەیەكی باوی سەردەم)دا ئەم مەسەلەیەم ڕوون كردۆتەوە، هەروەها لە كتێبی (چەند بابەتێكی سیاسی هاوچەرخ لەبەر ڕۆشنایی عەقڵ و وەحی دا)[١].

دوای ئەوە خوا ﷻ بانگی هەموو مرۆڤایەتی دەكات دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱعْبُدُوا۟ رَبَّكُمُ ٱلَّذِى خَلَقَكُمْ وَٱلَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ﴾، ئەی خەڵكینە! ئەو پەروەردگارەتان بپەرستن كە ئێوەو ئەوانەی پێش ئێوەی دروستكردوە، واتە هەر خوا بەدیهێنەری ئێوەیە، بۆیە با هەر ئەویش پەرستراوتان بێت ! دوایی دەفەرموێ: ئومێد وایە بەهۆی بەندایەتییتانەوە بۆ خوا، خۆتان بپارێزن، لە دنیادا خۆتان بپارێزن لە عەیبداریی و گوناهباریی و، لە دواڕۆژدا خۆتان بپارێزن لە سزاو جەزرەبەی خوا، واتە: خۆتان بپارێزن لەوەی كە خوا لێتان تووڕە بێت، وە لە ئەنجامی تووڕەبوونەكەیدا تووشی سزای سەخت و جەزرەبەو ئەشكەنجەی خوا ببن، بەپێی یاسای دادگەرانەی خوا، دوایی ڕوونی دەكاتەوە كە خەڵك بۆچی خوا بپەرستن؟ چونكە یەكێك بۆی هەیە بڵێ: باشە بۆچی بەندایەتیی بۆ خوا بكەین؟ ئەگەر تەماشای ئایەتەكانی قورئان بكەین وەك ئاڵقەكانی زنجیرێك هەمیشە یەكتر دەبەستنەوە، خوا ﷻ هیچ كاتێك فەرمانێك ناكات مەگەر حیكمەتەكەشی بەیان دەكات، یاخود بەڵگەو پاساوەكەشی بەیان دەكات، بەڵام ئینسان دەبێت سەرنج بدا، ئنجا بۆی دەردەكەوێ، لێرەدا دەفەرموێ: ﴿ ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُمُ ٱلْأَرْضَ فِرَٰشًا وَٱلسَّمَآءَ بِنَآءً وَأَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَأَخْرَجَ بِهِۦ مِنَ ٱلثَّمَرَٰتِ رِزْقًا لَّكُمْ ﴾، ئەوە پاساو و بەڵگە هێنانەوەیە كە بۆچی خەڵك بەندایەتیی بۆ بەدیهێنەرو پەروەردگاری خۆیان بكەن؟ دەفەرموێ: ئەو زەوی بۆتان ڕاخستوەو ئاسمانی بۆ

---

وەرگرتنی سەرانە نەكەوتوە، بە بەڵگەی وەرنەگیرانی سەرانە لە سێ تیرە جوولەكەكەی مەدینە (بنو قینقاع و النضیر و بنو قریظة)، لە زنجیرە وتاری: (ئیسلام و دەوڵەتداریی) یشدا بە درێژی ئەم بابەتەمان توێژیوەتەوە.

١) هەروەها لە زنجیرە وتاری: (ئیسلام و دەوڵەتداریی)یدا، كە لە (تەلەفزیۆنی ئاسمانیی پەیام)دا بلاودەكرێتەوەو پاشان دەشكرێتە كتێب، تیشكی باشم خستۆتە سەر.

كردوونـە سـەربان، وە لـە ئاسـمانەوە ئـاوی بـۆ ناردوونـە خـوار كـە هـەموو جـۆرە میوەجاتێك دەڕوێنێ، كە دەبێتە ڕزق‌و بژێو بـۆ ئێوە، واتـە: بۆیـە پـەروەردگارتان بپەرستن چونكە خاوەنی ئێوەیە، ژیێنـەری ئێوەیـە، ڕۆزی دەری ئێوەیـەو خـاوەنی نیعمەتی ئێوەیە، كەواتە: شتێكی زۆر مەنتیقییە كە تۆ ئـەو خوایـە بپەرستی كـە هەموو شتێكت لە وەوەیە: هەم بوونەكەت‌و هەم بـەردەوامبوونت لەسـەر بوونـت‌و هەم ژیان‌و گوزەرانت‌و هەم دنیـاو هـەم دوارۆژت، هـەمووی پەیوەستە بـە ویسـت‌و توانـای ئـەوەوە، پاشـان دەفـەرموێ: ﴿ فَلَا تَجْعَلُوا لِلَّهِ أَندَادًا وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴾، دەجا هاوتایان بۆ خوا دامەنێن لە حاڵێكدا دەزانن كە هاوتای نـین، واتـە: هـەر خـوا خاوەنی ئێوەو پەیداكەرو بەدیهێنەری ئێوەیەو ڕۆزیدەری ئێوەیـە، كەواتـە: بۆچـی هاوتایـانی بـۆ پەیـدا دەكـەن، جـا ئـەو هاوتایـە چ هـەواو ئـارەزوی خـۆت بـێ، چ طاغووتێك بێ، چ فیـرعەونێك بێ، چ حیزبێكی كافـر بێ، چ ڕژێمێكی طـاغـووتیی بێ، چ كەلوپەلێـك بێ، هەموو ئەوانە خوا ﷻ لە قورئاندا بە هاوتای خۆی دانـاون بـە پەرسـتـراوی خەڵـكی دانـاون، بـۆ وێنـە دەفـەرموێ: ﴿ أَفَرَءَيْتَ مَنِ اتَّخَذَ إِلَٰهَهُۥ هَوَىٰهُ ... ﴿٢٣﴾ ﴾الجاثیة، واتە: سەرنجی ئەو كەسە نـادەی كـە ئـارەزووی خـۆی كـردوە بە پەرسـتـراوی خـۆی، وە دەفـەرموێ: ﴿ أَمْ لَهُمْ شُرَكَٰٓؤُا۟ شَرَعُوا۟ لَهُم مِّنَ الدِّينِ مَا لَمْ يَأْذَنۢ بِهِ اللَّهُ ﴿٢١﴾ ﴾ الشورى، واتە: ئایا چـەند هاوبەشـێكیان هـەن كردوویـانن بـە هاوبەشـی خـوا، كـە شـەریعەت‌و بەرنامـەی ژیانیـان بـۆ دادەنـێن بـەبێ مۆڵـەت پێـدانی خـوا؟! یـان دەفـەرموێ: ﴿ ... أَنِ اعْبُدُوا اللَّهَ وَاجْتَنِبُوا الطَّٰغُوتَ ﴿٣٦﴾ ﴾ النحل، واتە: بەندایەتیی بۆ خـوا بكـەن‌و خۆتـان لـە طـاغـووت دوور بگـرن، كەواتـە طـاغـووت (نِدّ)ی خوایـەو دەكـرێ بـە هاوتـای خـوا، وە پێغەمبـەر ﷺ كەلوپـەل‌و شـمەكیشـی بـە جۆرێـك لـە پەرسـتـراو دانـاوە، كاتێـك كـە ئینسـان هـەموو ژیـانی خۆی بۆ تەرخان دەكاو دەیكـات بـە جێـی ئەوپـەڕی ئیهتمـامی خـۆی، فەرموویـەتی: {(تَعِسَ عَبْدُ الدِّينَارِ، تَعِسَ عَبْدُ الدِّرْهَمِ، تَعِسَ عَبْدُ الْقَطِيفَةِ...) (رَوَاهُ الْبُخَارِيّ بـرقم: (٢٨٨٦)، وَابْنُ مَاجَهْ بـرقم: (٤١٣٥)، وَابْنُ حِبَّانَ بـرقم: (٣٢١٨)، عَنْ أَبِي

هُرَيرَةَ ﵁}، واتە: بەدبەختە ئەو کەسەی دەبێتە بەنـدەی زێڕو زیـو، بەدبەختـە ئەو کەسەی دەبێتە بەندەی جل‌و بەرگ، (قَطِيفَة) جۆرێکە لە پۆشـاك.

دوایـی خـوا ﷻ دەفـەرموێ: ﴿ وَإِن كُنتُمْ فِي رَيْبٍ مِّمَّا نَزَّلْنَا عَلَىٰ عَبْدِنَا ﴾، چـونکە بەندایەتیی بۆ خوا یەکسەر پەیوەستە بە بەرنامەی خواوەو پەیوەسـتە بـە کتێبی خـواوە، ئێمـە چـۆن بەندایـەتیی بـۆ خـوا بکـەین؟ وەك لـە تەفـسیری سـوورەتی فاتیحەدا باسم کرد، کاتێك دەتوانین تەنیا خوا بپەرستین، وە یارمـەتی بـەس لـەو بخوازین کە ڕێگای ڕاست بگرین، ڕێگای ڕاستی خواش لە کـتێبی خـوادا بەرجەسـتە دەبێت، پاشان لە سوننەتی پێغەمبەری پێـشەوادا ﷺ، بۆیـە یەکـسەر دەفـەرموێ: وە ئەگەر لە گوماندان لـەو کتێبـەی کـە بـۆ سەر بەنـدەی خۆمانمـان ناردوومانەتـە خـوار، واتـە: ئـەو قورئانـەی کـە بـۆ موحەممـەدمان نـاردوە ﷺ ئەگـەر لێـی لـە گوماندان، بۆیـە نایکەنـە بەرنامـەی ژیانتـان‌و نایکەنـە ڕێبازتـان، کە بـە پێـی ئـەو بەرنامەیـە بەندایـەتیی بـۆمن بکـەن، ﴿ فَأْتُوا بِسُورَةٍ مِّن مِّثْلِهِ ﴾، ئـەوە وێنـەی سوورەتێکی وەك قورئـان بێنن، یانی: ئەگەر بەگومـانن لەوەی کـە موحەممـەد ﷺ لـە خـواوە قورئـانی بـۆ دابـەزیوەو، پێتـان وایـە خـۆی دایـناوە، یـان لـە شـوێنێکەوە وەریگرتـوە، کـە کـافرەکان هـەموو ئـەو جـۆرە تۆمەتـەیان گوتـوە، ئـەوە وەك کوردەواریی خۆمان دەڵێن: (مەیدان مـشکان نەکـێڵاوە) فـەرموون ئێـوەش وێنـەی سوورەتێکی قورئـان بێـنن ﴿ وَادْعُوا شُهَدَاءَكُم مِّن دُونِ اللَّهِ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ ﴾، وە هەرچـی شـایەدییتان بـۆ دەدا کە قورئـان لـە خـواوە بـۆ موحەممـەد ﷺ نـەهاتوە، ئەوانـەش هـەموو بـانگ بکـەن، بێجگـە لـە خـوا، یـاخود هـەموو ئەوانـەی کـە هاوکارییتـان دەکـەن بانگیـان بکـەن، چـونکە (شُهَدَاء) وێـڕای شـایەدان بـە مانـای هاوکاران (أعوان)یش هـاتوە، ﴿ فَإِن لَّمْ تَفْعَلُوا ﴾، جا ئەگەر نەتانکرد، واتە: وێنـەی سـوورەتێکی قورئانتـان نـەهێنا ﴿ وَلَن تَفْعَلُوا ﴾، وە دڵنیـاش بـن نایکـەن‌و بۆتـان نـاکرێ ﴿ فَاتَّقُوا النَّارَ الَّتِي وَقُودُهَا النَّاسُ وَالْحِجَارَةُ ﴾، کەوایـە خۆتـان لـە ئاگرێـك بپـارێزن کـە سـووتەمەنییەکەی ئینـسانەو بـەردە، واتـە بـەوە خـۆش دەکـرێ‌و

بڵێسەدار دەکرێ، بەچی خۆتان بپارێزن لەو ئاگرە؟ بە ئیمان هێنان بە قورئـان، وە بە ئیمانهێنان بە موحەممەد ﷺ، وە بەندایەتییکردنتان بۆ خـوا، چونکە ئەو ئاگرە بۆ کێ ئامادە کراوە؟ ﴿ أُعِدَّتْ لِلْكَٰفِرِينَ ﴾، بۆ کافران ئامادە کراوە، کەواتە: ئێوەش ئەگەر کافربن، ئەوە سەرەنجامتان نێو ئەو ئاگرە ئامادەکراوو بڵێسەدارە دەبێ.

## چەند مەسەلەیەکی گرنگ

**مەسەلەی یەکەم:** لە قورئاندا هەمیشە خوا ﷻ پەروەردگارێتیی و بەدیهێنەرایەتی خۆی، دەکاتە بەڵگەو پاساوی پەرستراوێتیی خۆی، واتە: بە خەڵك دەفەرموێ بەندایەتییم بۆ بکەن، چونکە پەروەردگارتانمو بەدیهێنەرتانمو خاوەنتانم، ئنجا ئایا ئەوە مانای چییە؟ واتە:

١ – بەندایەتییکردنتان بۆ بەدیهێنەری خۆتانو پەروەردگارتانو خاوەنتان، شتێکی مەنتیقییە، مادام ئێوەی دروستکردوەو ئێوە پەروەردە دەکات، وە مشوورتان لێ دەخواو دەتانژیێنێ، بەندایەتیی بۆ بکەن، مادام چاکەی لەگەڵ کردوون، ئێوەش بە چاکە وەڵامی چاکەکەی بدەنەوەو سوپاسگوزاریی بۆ بکەن.

٢ – مانایەکی دی لێ وەردەگیرێ، ئەویش ئەوەیە کە بێجگە لەو پەروەردگارو بەدیهێنەرەتان، کەسی دیکە شایستەی ئەوە نیە ببنە بەندەو ببنە ملکەچی، تەنیا دروستکەرو پەروەردگارە، کە شایستەی ئەوەیەو هەقی ئەوەی هەیە کە بەندەکانی بیپەرستنو بەندایەتیی بۆ بکەن.

**مەسەلەی دووەم:** تەقوا بەبێ عیبادەت پەیدانابێ، چونکە دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱعْبُدُوا۟ رَبَّكُمُ ٱلَّذِى خَلَقَكُمْ وَٱلَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ﴾، واتە: بۆیە عیبادەت بۆ پەروەردگارتان بکەن تاکو تەقواتان پەیدابێ، بەڵێ تەقوا بەرهەمی عیبادەتەو، ئینسان تا (عابد)تر بێت بۆخوا، موتتەقی تر دەبێت، وە هەتا عیبادەتی باشتر بێت، تەقوای چاکتر دەبێت، چونکە وەك باسم کرد، تەقوا

واتە: خۆ پاراستن لەوە کە خوا لێت تووڕە بێت، ئنجا بەچی خۆت لەوە دەپارێزی کە خوا لێت تووڕە بێت؟ بە بەندایەتیی کردن بۆ خوا، بەڵێ بەڕاستی کەسێك بەندەی خوا بێت، وادەکات کە بە هیچ شێوەیەك خوا لێی تووڕە نەبێ، یانی: بە هیچ شێوەیەك قەدەغەکانی خوا نەشکێنێ‌و واجبەکانی خوا نەچووێنێ.

**مەسەلەی سێیەم:** یەکتایی خوا (وحدانیة الله)، ﷻ لە بەدیهێنەرایەتیی‌و لە پەروەردگاریێتی‌و لە خاوەنداریێتیدا، واتە: ئەوە کە خوا هەرخۆی بەدیهێنەرو پەروەردگارو خاوەنە، دەخوازێ کە تەنیا خۆیشی پەرستراو (مَعبود) بێت، بۆیە دەفەرموێ: ﴿ فَلَا تَجْعَلُوا لِلَّهِ أَندَادًا وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴾، واتە: کاتێك کە ئێوە دەزانن بێجگە لە خوا پەروەردگارێك‌و خاوەنێکی دیکەتان نیە، با بێجگە لەویش پەرستراوێکی دیکەتان نەبێ.

**مەسەلەی چوارەم:** خوا پەرستیی بەبێ شوێن پێ هەڵگرتنی پێغەمبەر ﷺ وە بەبێ پابەندیی بەو کتێبەوە کە خوا بۆ موحەممەدی ناردوە ﷺ نایەتەدی، بۆیە خوای کاربەجێ یەکسەر دوای فەرمانکردن بە بەندایەتییکردن بۆ خوا، باسی ئیمانهێنان دەکات بەو کتێبە کە خوا بۆ موحەممەدی ﷺ ناردوە، وە تاکە موعجیزەو بەڵگەی پێغەمبەرە، کە بە بەڵگەی هێناوەتەوە لەسەر پێغەمبەرایەتی خۆی، چونکە (موحەممەد) تەنیا قورئانی بە بەڵگە هێناوەتەوە بۆ پێغەمبەرایەتی خۆی، ئەگەرنا موعجیزەی دیکەی زۆربوون، بە بەڵگەی چەندان ئایەت‌و فەرمایشتی پێغەمبەر ﷺیش ڕوونیکردۆتەوەو[1] فەرموویەتی: {(مَا مِنَ الأَنبِيَاءِ نَبِيٌّ إِلاَّ أُعْطِي مَا مِثْلُهُ آمَنَ عَلَيهِ البَشَرُ، وَإِنَّمَا كَانَ الَّذِي أُوتِيتُ وَحياً أوحَاهُ اللهُ إِلَيَّ، فَأَرْجُو أَنْ أَكُونَ أَكثَرَهُمْ تَابِعاً يَومَ القِيَامَةِ) (رَوَاهُ البُخَارِيُّ بِرقم: (٤٩٨١)، وَمُسْلِم بِرقم: (٣٨٣)، عَن أَبِي

---

١) واتە: ئەوەی ڕوونکرۆتەوە کە تاکە موعجیزەو بەڵگە، بۆ ئیسپاتی پێغەمبەرایەتی (محمد) ﷺ، کە پێغەمبەری خوا بە بەڵگەی هێناوەتەوە، قورئانە .

هُرَيرَة رضي الله عنه}، واتە: هیچ کام لە پێغەمبەرانی خوا نەبوون (علیهم الصلاة والسلام) کە بەڵگەیەکی پێ نەدرێ لەسەر ئەوە خەڵك ئیمانی پێ بێنن (وە بزانن کە ڕاست دەکات)، وە ئەوەی بەمن دراوە لەو بوارەدا، وەحییە بۆم هاتوە، (واتە: ئەوەی کە پێم دراوە وەك بەڵگە لەسەر پێغەمبەرایەتییم، وەحی‌و پەیام‌و بەرنامەی خوایە)، بۆیە ئومێدم وایە کە لە ڕۆژی دواییدا لە هەموویان شوێنکەوتووم زیاتر بن، چونکە هی ئەو ماوەتەوە، بەڵام موعجیزەی پێغەمبەرانی دیکە (علیهم الصلاة والسلام) بە وەفاتی خۆیان کۆتایی‌یان پێهات، ئەوەش بۆچی؟ چونکە پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) هەر کامێکیان بۆ قۆناغێك‌و هەلومەرجێك‌و بۆ گەل‌و میللەتێکی دیاریکراو هاتوون‌و موعجیزەکەیان هەر ئەوەندە پێویست بووە، بەڵام پێغەمبەری کۆتایی بۆ هەموو بەشەر هاتوە، بە پانایی زەمین بە درێژایی زەمان، بۆیە موعجیزەکەشی هەموو ڕۆژگارو سەرزەمینی گرتۆتەوە.

**مەسەلەی پێنجەم:** خوای پەروەردگار لە قورئاندا، کە قورئان گەورەترین موعجیزەی پێغەمبەرە ﷺ، بە سێ قۆناغ تەحەددای ئەهلی کوفری کردوە، کە ئەوانەی بڕوا ناهێنن بە (محمد المصطفى) ﷺ وەك پێغەمبەری خوا، وەك کۆتایی پێغەمبەران، وە بڕوا ناهێنن بەو کتێبەی خوا، کە دوایین کتێبی خوایەو دوایین نوسخەی هیدایەتی خوایە با ئەوانیش شتێکی وا بێنن، سێ قۆناغەکەش بریتین:

١- لە قۆناغی یەکەمدا فەرموویەتی: کتێبێکی وەك قورئان بێنن، واتە: ئەوەندە قورئانەی، کە ئەو کاتی هاتۆتە خوارێ، وەك لە سووڕەتی (الإسراء) ئایەتی (٨٨)دا، دەفەرمووێ: ﴿ قُل لَّئِنِ ٱجۡتَمَعَتِ ٱلۡإِنسُ وَٱلۡجِنُّ عَلَىٰٓ أَن يَأۡتُواْ بِمِثۡلِ هَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانِ لَا يَأۡتُونَ بِمِثۡلِهِۦ وَلَوۡ كَانَ بَعۡضُهُمۡ لِبَعۡضٖ ظَهِيرٗا ﴾، واتە: (ئەی موحەممەد ﷺ) تۆ پێیان بڵێ: ئەگەر ئادەمیزادو جن هەموویان کۆببنەوە سەریەك‌و هاوکاری یەکتربن، کە وێنەیەکی وەك ئەم قورئانە بێنن، ناتوانن

وێنـەی بێـنن، هەرچـەندە پـشتگیریی یەکتـریش بکـەن، وە بـە کـردەوەش نەیانتوانی، هەر لەوبارەوە خوا لە سووڕەتی (الطور)دا دەفەرموێ: ﴿ أَمْ يَقُولُونَ تَقَوَّلَهُۥ ۚ بَل لَّا يُؤْمِنُونَ ﴿٣٣﴾ فَلْيَأْتُوا۟ بِحَدِيثٍ مِّثْلِهِۦٓ إِن كَانُوا۟ صَـٰدِقِينَ ﴿٣٤﴾ ﴾، واتە: یان ئایا دەڵێن: (محمد ﷺ) بۆخۆی قورئانی هەڵبەستووەو لە خۆیەوە گوتوویەتی! بەڵکو هەر نایانەوێ ئیمان بێنن، ئەگەرنا با ئەوانیش قسەیەکی وەك وی بێنن (واتە: وەك قورئان) ئەگەر ڕاست دەکەن، لە قۆناغی یەکەمدا ئەوە دیارە کەس نـەیتوانی وەڵامـی ئـەم تەحەددایـەی قورئـان بداتـەوەو، شـتێکی وەك قورئـان بێـنێ، بۆیـە خـوای زانـاو توانـا ئـەمجار بۆیـان دابـەزی بـۆ ئاسـتێکی نزمتـرو کەمتـری لـێ داواکـردن.

٢- لە قۆناغی دووەمدا داوای دە (١٠) سووڕەتی لێکردن، وەك لە سووڕەتی (هود) ئایـەتی (١٣، ١٤)دا، دەفـەرموێ: ﴿ أَمْ يَقُولُونَ ٱفْتَرَىٰهُ ۖ قُلْ فَأْتُوا۟ بِعَشْرِ سُوَرٍ مِّثْلِهِۦ مُفْتَرَيَـٰتٍ وَٱدْعُوا۟ مَنِ ٱسْتَطَعْتُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ إِن كُنتُمْ صَـٰدِقِينَ ﴿١٣﴾ فَإِلَّمْ يَسْتَجِيبُوا۟ لَكُمْ فَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّمَآ أُنزِلَ بِعِلْمِ ٱللَّهِ وَأَن لَّآ إِلَـٰهَ إِلَّا هُوَ ۖ فَهَلْ أَنتُم مُّسْلِمُونَ ﴾، واتـە: یاخود دەڵێن: (محمد ﷺ) بۆخۆی قورئانی هەڵبەستوە، (گریمان وایە!) بڵێ: ئێـوەش دە سـووڕەتی هەڵبەسـتراوی وەك قورئـان بێـنن، (نـاڵێن: قورئـان هەڵبەستراوە؟! موحەممەد ﷺ بۆخۆی هەڵیبەستوە، دە ئێوەش دە سووڕەتی وەك وی بێـنن) وە کـێش لـە تواناتـان دایـە کـۆی بکەنـەوە هاوکارتـان بێـت، هەموویان کۆبکەنـەوەو داوای یارمـەتی لـەوانیش بکـەن، ئەگـەر ڕاسـت دەکـەن. دوایـی ڕوو لـە مـسوڵمانانو لـە پێغەمبـەر ﷺ دەکـاتو دەفـەرموێ: ئەگـەر وەڵامیـان نەدانـەوە، ئـەوە بـزانن کـە ئـەم قورئانـە بـە زانیـاری خـوا هـاتوە، (شـتێکیش بـە زانیـاری خـوا بێـت، زانیـاری بەشـەر ناتوانـێ بەرانبـەریی بکـات، چونکە شتێك بە زانیاری خوا بێت، هەڵەی تێدانیـە بەقـەد نـووکی دەرزی، وە شتێك بەپێی زانیاری خوا بێت، کـە زانیـاری خـوا دەوری هـەموو شـتێکی داوە، دیـارە هـەموو ئـەو نهێنییانـەی تێـدان، کـە ژیـانی ئینـسان پـەکی لەسـەریان

کەوتوەو، پەیوەستیشن بە تێکڕای بوون (وجود)ەوە، وەك لە سوورەتی (الفرقان) لە ئایەتی (٦)دا، دەفەرموێ: ﴿ قُلْ أَنزَلَهُ ٱلَّذِى يَعْلَمُ ٱلسِّرَّ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ إِنَّهُۥ كَانَ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴾، واتە: بڵێ کەسێك قورئانی ناردۆتە خوار، کە هەرچی نهێنییەکانی ئاسمان‌و زەوی هەیە دەیانزانێ، کەواتە: کەسێکیش دەتوانێ وێنەیەکی قورئان بێنێ، کە زانیاری هەبێ بە هەموو نهێنییەکانی ئاسمان‌و زەوی‌و، ئەوەش کەس نیە جگە لە خوا، ئنجا کە ئەوەشیان نەتوانی خوا لە قۆناغی سێیەم دا زیاتر بۆیان دابەزی.

٣- لە قۆناغی سێیەمدا تەحەدداى کردن، کە بتوانن یەك سوورەت بێنن، وەك لە سوورەتی (یونس) لە ئایەتی (٣٨، ٣٩)دا، دەفەرموێ: ﴿ أَمْ يَقُولُونَ ٱفْتَرَىٰهُ ۖ قُلْ فَأْتُوا۟ بِسُورَةٍ مِّثْلِهِۦ وَٱدْعُوا۟ مَنِ ٱسْتَطَعْتُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٣٨﴾ ﴾، واتە: یان دەڵێن: هەڵیبەستوە، بڵێ: وێنەی سوورەتێکی قورئان بێنن، وە کێش لە تواناتاندا هەیە هاوکارییان لێ وەربگرن، جگە لە خوا بانگیان بکەن، ئەگەر ڕاست دەکەن، دوایی دەفەرموێ: ﴿ بَلْ كَذَّبُوا۟ بِمَا لَمْ يُحِيطُوا۟ بِعِلْمِهِۦ وَلَمَّا يَأْتِهِمْ تَأْوِيلُهُۥ ۚ كَذَٰلِكَ كَذَّبَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ۖ فَٱنظُرْ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٣٩﴾ ﴾ یونس، واتە: بەڵکو شتێك بەدرۆ دەزانن کە پەییان پێ نەبردوە، (عەقڵیان پێی ناشکێ‌و تێیناگەن، بۆیە بەدرۆی دەزانن) وە جارێ تەئویلی ئەو قورئانەشیان بۆ نەهاتوە، واتە: ئەو هەواڵانەی کە قورئان هەواڵی پێداون، جارێ نەهاتوونەتە دی، کە یەکێك لە هەواڵەکان ئەوەیە کە لە کۆتایی سوورەتی (ص)دا خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ إِنْ هُوَ إِلَّا ذِكْرٌ لِّلْعَٰلَمِينَ ﴾، واتە: لە مەودوا بۆتان دەردەکەوێ هەواڵی قورئان کە بەرنامەیە بۆ هەموو جیهانییان، وە ئێستا دەرکەوت کە قورئان هیدایەتە بۆ هەموو بەشەر، نەك وەك کافرەکانی مەککە گومانیان دەبرد.

**مەسەلەی شەشەم:** وەك چۆن خوا ﷻ لە سەرەتای بیستو نۆ (٢٩) سووڕەت دا پیتە پچڕپچڕەکانی هێنان، بۆ ئەوەی هەمیشە ئەوەیان بە گوێدا بدات کە ئەو قورئانەی ئێوە دەڵێن: موحەممەد ﷺ لە خواوە نەیهێناوە، هەر لەو پیتانە دروست بووە، دەی ئێوەش ئەگەر ڕاست دەکەن قورئانێکی وا یان دە سووڕەت، یان سووڕەتێکی وا بێنن، وەك چۆن خوا هەموو پیتەکانی لە یەك سووڕەتدا نەهێنانو بیستو نۆ (٢٩) جار ئەوەی دووبارە کردۆتەوە، لە سەرەتای بیستو نۆ (٢٩) سووڕەت دا، بەهەمان شێوەش خوای بەرزو مەزن، تەحەددای خۆی بە سێ قۆناغ خستنە ڕوو، کە سەرەنجام چ ئەهلی کوفری مەککە، چ ئەهلی کوفری شوێنەکانی دیکەو تا ئێستاش، دەستەوستان بوونو دەستەو ئەژنۆ کەوتوون، لەبەردەم تەحەددای قورئان دا.

**مەسەلەی حەوتەم:** باسی موعجیزە بوونی قورئانمان کردو گوتمان پێغەمبەری خوا ﷺ تاکە موعجیزەیەك کە بە بەلگەی هێناوەتەوە بۆ ئیسپاتی پێغەمبەرایەتی خۆیو، وە تەحەددای مرۆڤایەتی پێ کردوە، بریتی بووە لە قورئان، جا بەڵگەبوونی قورئان لەسەر ڕاستیی پێغەمبەرﷺ ، زانایانی ئیسلام لە دێرزەمانەوە لێیان کۆڵیوەتەوە، کە ئایا قورئان لە چ ڕوویەکەوە بەڵگەو موعجیزەیە؟ زانایانی پێشوو (ڕەحمەتی خوایان لێبێت) بە زۆری لەڕووی زمانەوانییەوە: لەڕووی ڕەوانبێژییو زمان پاراوییو لە ڕووی بەیانەوە، قورئانیان بە موعجیزە داناوە، چونکە ئەو کاتە کە قورئان هاتۆتە خوار لەنێو گەلی عەرەبدا، زیاتر مەسەلەی وتاربێژییو شیعر گوتنو زانیاریەکانی بەیان (علوم البیان) باو بوونە، بۆیە زۆر لە زانایان پێیان وابووە، کە قورئان زیاتر لە ڕووی بەیانییەوەو لەڕووی ڕەوانبێژییو فەصاحەتەوە، موعجیزەیە، بەلام لەڕاستیدا قورئان لە هەموو ڕوویەکەوە موعجیزەیە، چونکە پێغەمبەری کۆتایی ﷺ بۆ هەموو بەشەریەتەو، تەحەددای هەموو بەشەریەتی کردوە، بۆیە کاتێك قورئان دەبێتە بەلگە لەسەر پێغەمبەرایەتی موحەممەد ﷺ، کە هەروەك چۆن بۆ کەسانێك کە سوارچاکی مەیدانی ڕەوانبێژییو زمانەوانیین

بەڵگەیەو دەستەوەستانکەرە، بەهەمان شێوە بۆ خەڵکی دیکەش کە لە مەیدانەکانی دیکە دان، بۆ وێنە لەڕووی پزیشکییەوە (طب)، لەڕووی گەردووناسییەوە، لەڕووی فەلسەفەوە، لەڕووی زانیارییە عەقڵییەکانەوە، لەڕووی یاسایی‌و قانوونییەوە، لەڕووی مێژوو زانییەوە، لەڕووی هەموو لقەکانی زانستەوە، کاتێك قورئان دەبێتە بەڵگە لەسەر پێغەمبەرایەتی موحەممەد ﷺ، کە لە هەموو بوارەکاندا بەڵگەو موعجیزە بێت‌و، لەو بوارەدا هیچ کەس نەتوانی وەك قورئان بێنێ، تەنانەت لەڕووی نەغمەو دەنگ‌و ئیقاعیشەوە، قورئان هەر موعجیزەیەو ئەو شێوە ئاوازو ئیقاعانەی، کە قورئان خوێنەکان لەکاتی خوێندنی قورئاندا دەتوانن داهێنانیان تێدا بکەن، هیچ دەقێکی دیکە ئەو هەموو هونەرنواندن (تفنُّن)ەی، تێدا ناکرێ، هەروەها لەڕووی نووسین (خط)ەوە خۆشنووسەکان وەك لە قورئاندا دەتوانن هونەرنواندن بکەن، لە هیچ جۆرە نووسینێکی دیکەدا ناتوانن ئاوا ئەسپی خۆیان لەو مەیدانەدا تاوبدەن.

هەڵبەتە ئێمە لێرەدا هەر دەبێت ئاماژەی پێبکەین، ئەگەرنا من لەو کتێبەی کە لە زیندانی ئەمریکییەکاندا نووسیومە: (الإسلام كما يتجلّى في كتاب الله) لە فەصلێکی تایبەتدا باسم کردوە، کە ڕووەکانی ئیعجازی قورئان بێ سنوورن‌و من لەوێدا باسی دەوری (١٥ تا ٢٠) ڕوو و لایەنم کردوەو، هەموویشی وێنەم بۆ هێناوەتەوە، کەواتە، کە دەڵێین: قورئان موعجیزەیە، واتە قورئان غەیری خۆی دەستەوستان دەکات، ئەوە تەنیا لە ڕووێك‌و دووانەوە نیەو، لە هەموو ڕووێکەوە قورئان موعجیزەیەو، هیچ کەس ناتوانێ شان لە شانی قورئان بدات، بەڵکو ناتوانێ تۆزی ڕێگاشی بشکێنی لە هیچ بوارێکدا.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی شەشەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان لە سێ (٣) ئایەت پێکدێت، ئایەتەکانی (٢٥ و ٢٦ و٢٧) لە سوورەتی (البقرة)، و ئەو سێ ئایەتە دوو بابەت دەگرنە خۆیان:

<u>یەکەم</u>: پاداشتی ئیمانداران لە دوارۆژدا، دوای ئەوەی باسی سزای بێبڕوایان کرا.

<u>دووەم</u>: مەسەلەی وێنە هێنانەوە (ضرب المثل)، کە قورئان وێنە هێنانەوەی زۆری تێدایەو، وەك پێشتر باسم کرد حیکمەتی وێنە هێنانەوەش ئەوەیە، کە مەبەستە مەعنەوییەکان لە شێوەی ماددییو بەرهەستدا بەرجەستە بکرێن، بۆ ئەوەی ئینسان باشترو ئاسانتر لێیان تێبگات، جا خوای بەرز لەم ئایەتانەدا باسی وێنە هێنانەوەو هەڵوێستی ئەهلی ئیمان لە بەرانبەر وێنە هێنانەوەی قورئان، وە هەڵوێستی ئەهلی کوفریش باس دەکات.

﴿ وَبَشِّرِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ أَنَّ لَهُمْ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ ۖ كُلَّمَا رُزِقُواْ مِنْهَا مِن ثَمَرَةٍ رِّزْقًا ۙ قَالُواْ هَٰذَا ٱلَّذِى رُزِقْنَا مِن قَبْلُ ۖ وَأُتُواْ بِهِۦ مُتَشَٰبِهًا ۖ وَلَهُمْ فِيهَآ أَزْوَٰجٌ مُّطَهَّرَةٌ ۖ وَهُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿٢٥﴾ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَسْتَحْىِۦٓ أَن يَضْرِبَ مَثَلًا مَّا بَعُوضَةً فَمَا فَوْقَهَا ۚ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ فَيَعْلَمُونَ أَنَّهُ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّهِمْ ۖ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فَيَقُولُونَ مَاذَآ أَرَادَ ٱللَّهُ بِهَٰذَا مَثَلًا ۘ يُضِلُّ بِهِۦ كَثِيرًا وَيَهْدِى بِهِۦ كَثِيرًا ۚ وَمَا يُضِلُّ بِهِۦٓ إِلَّا ٱلْفَٰسِقِينَ ﴿٢٦﴾ ٱلَّذِينَ يَنقُضُونَ عَهْدَ ٱللَّهِ مِنۢ بَعْدِ مِيثَٰقِهِۦ وَيَقْطَعُونَ مَآ أَمَرَ ٱللَّهُ بِهِۦٓ أَن يُوصَلَ وَيُفْسِدُونَ فِى ٱلْأَرْضِ ۚ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْخَٰسِرُونَ ﴿٢٧﴾ ﴾

## مانـــای وشـــە بە وشـــەی ئایەتەكـــان

((وە موژدە بدە بەوانـەی بڕوایـان هێنـاوەو چاكەكان ئـەنجام دەدەن، كـە چـەند باغێكیان هەن ڕووباریان بە ژێردا دەڕۆن، هەر كاتێـك میوەیـەكیان لـەو باغانـە بـۆ كرایە بژێوو پێیان درا، دەڵێن: ئـەوەبوو كـە پێـشتـر پێمـان درا، وە بـە وێكـچوویی بۆیان هێنرا، وە هاوسەرانێكی پاكیزەیـان لەوێـدا هـەن، وە بـە هەمیـشـەیی تێیانـدا دەمێننـەوە﴿٢٥﴾ بێگومـان خـوا شـەرم ناكـات كـە وێنـە بێنێتـەوە بـە مێـشـوولەو سەرووتریش، جا ئەوانەی بڕوایان هێناوە دەزانن كە ئەوە هەقە لە پەروەردگاریانەوە، بەڵام ئەوانەی بێبڕوان، دەڵێن: ئایا خوا مەبەستی لـەم وێنـە هێنانـەوە چییە؟ كە زۆر كەسی پێ سەرگەردان دەكاتو زۆر كەسیشی پێ ڕێنمایی دەكات، بەڵام جگە لە لادەران هـیـچ كەسـی پـێ گـومڕا ناكـات﴿٢٦﴾ ئەوانـەی كـە پـەیمانی خـوا پـاش پتـەوكردنی هەڵدەوەشـێننەوە، وە ئـەوەی كـە خـوا فـەرمانی پێكـردوە بگەیـەنرێ دەیپچڕێنن، وە خراپەكاریی لە زەویدا دەكەن، ئا ئەوانەن زیانباران﴿٢٧﴾)).

## شـیكردنەوەی هەندێـك لە وشـەكان

(وَبَشِّرِ): واتە: مـوژدە بـدە، (أبشـرتُ الرَجُـلَ وَبَشَّـرْتُهُ وَبَشَـرْتُه: أي أخبَـرتُهُ بِسَارٍّ بَسَطَتْ بَشْرةُ وَجهِـهِ)، واتـە: هەواڵـێكی خۆشـم پێـدا كـە لـە ئەنجامـدا دەموچاوی پێ گـەش بۆوە، ڕووی پێی گـەش بۆوە.

(جَنَّتٍ): كۆی (جَنَّـة)یە، (جَنَّـة) واتـە: بـاغ، بـاغو بێـستان (الجَنَّةُ: كُلُّ بُستانٍ ذي شَجَرٍ يَسْتُرُ بأشجارِهِ الأرض). واتە: (جَنَّة) هـەر بێـستانو باغێكە، كە درەخـتو داری زۆری تێـدا هـەبن، چـڕوپڕ بـن، زەوی دابپۆشـێ، هـەر وشـەی (جَنَّـهُ) بۆ خۆی واتە دایپۆشی، (مَجنُون)، واتە: شێت، بۆیە وای پێ دەگوترێ، چونكە عەقڵی داپۆشـراوە، وە كۆرپە بۆیە پێی دەگوترێ: (جنین) چـونكە لـە

سـکی دایکیـدا ونو پەنهانــە، (جنـد) بۆیــە پێیــان دەگــوترێ (جـن)، چــونکە پەنهانن‌و خەڵك نایان بینــێ.

(تَحۡتِهَا )، (تَحۡـتِهَـا: أي تَحۡـتَ أشـجَارَهَا) واتــە: بــەژێر درەختەکانیـدا، ڕووبــارەکان دەڕۆن.

(ٱلۡأَنۡهَـٰرُ )، (جَمـعُ النَّهَـرَ، وَهُوَ مَجـرَى المَـاءِ الفـائِضِ)، (أنهَــار) کـۆی (نَهَـر)ە، وە وشـەی (نَهَـر) بەو شوێنە چاڵە دەگوترێ کە ڕووباری پێـدا دەڕوا، ئـاوی پێـدا دەڕوا، وە ڕووبــار (نَهَــر) لــە نێـوانی دەریـــاو جۆگەلــەی بـچووك دایــە، واتــە: ئاوێکــی زۆر.

(مُتَشَٰبِهًا )، واتە میوەی بەهەشــتیان بۆ دەهێنــرێ وێك دەچــێ (أي يُشـبِهُ بَعضُـهُ بَعۡضَـاً لَوۡنـاً، وَلَيۡـسَ طَعۡمَاً وَحَقيقَـةً)، واتە: لە ڕەنگدا هەندێکی بە هەندێکـی دەچێ، بەڵام نەك لە تام‌و حەقیقـەتدا.

(لَا يَسۡتَحۡيِۦٓ )، واتە: شەرم ناکات. (الحَيَاءُ: إنقِباصُ النَّفۡسُ عَن القَبَـائِحِ وَ تَركُـهُ) (حَيَـــاء) بریتیــە لــەوە کــە ئینــسان لــە کاتێکــدا لەگــەڵ شــتێکی ناشیــرین ڕووبـەڕوو دەبێتـەوە، حاڵـەتێکی گــرژیی‌و هاتنـەوەیەکـی بـۆ دروسـت بێت، وە واز لەو شتە بێنـی، کە لێرەدا خوای پەروەردگار مەبەست پێی واز لێهێنانی شـتەکەیە، ئەگـەرنا ئـەو حاڵەتـەی کـە ئینـسان شـەرم دەکـات‌و بـۆی دروسـت دەبــێ، کـە گرژیـی‌و هــاتنەوە یەکـە، ئـەوە بـۆ خـوا ﷻ ڕاسـت نیـە، چـونکە حاڵــەتی نەفـسیی‌و جەسـتەیی کە لـە ئێمــە ڕوو دەدەن، لـە خـوا ڕوو نــادەن، بـەڵام مەبەسـت پێـی هاتنـەدی ئەنجامەکەیـەتی‌و، کەسێك شـەرمی لـە شـتێك کــرد، ئەو شـتە ناکـات، واتە خــوای بێ هاوتــا ئــەو شــتە تــەرك ناکــات، کــە وێنــە هێنــانەوەیە.

(يُضِـلُّ )، واتــە گومڕادەکـات (أصۡـلُ الـضَـلال: العـدُولُ عَـن الطَّرِيـقِ المُـستَقِيم)، واتە: (ضـلال) لە بنـەڕەتدا لادانە لەڕێی ڕاسـت.

(ٱلْفَٰسِقِينَ ): کـۆی (فاسـق)ە، واتـە: لادەر، ئەسـڵی وشـەی (فِسْـق)یـش، لـە (فَسَـقَ)ەیە، یانی: (خَـرَجَ) دەرچوو، دەگـوترێ: (فَسَقَـتِ الرُّطَبَـةُ، إذَا خَرَجَـتْ عَنْ قِشْرِهَا)، واتە: فەریکە خورما دەرچوو، هەرکات لە کیفەکەی هاتەدەرێ، میوەکە لە توێکڵەکەی دێتە دەرێ، کەواتـە (فَسَقَ)، واتـە: دەرچـوو، لایـدا، کـە لێرەدا مەبەست دەرچوون‌و لادانە لە سنووری شەرع.

(يَنقُضُونَ ): واتـە: هەڵدەوەشـێننەوە، (النَّقْـضُ: إنْتِـثَارُ العَقْـدِ مِـنَ البِنَـاءِ وَالحَبْـلِ، وَالعَقْـدِ هُـوَ الإبْـرَامِ) (النَّقْضُ)، واتـە: بڵاوکردنـەوەو هەڵوەشـاندنەوە، جـا چ خـانوو بێـت، چ گـوریس بێـت، چ گرێـدانێك بێـت، چ پـەیمانێك بێـت، ئـەویش پێچـەوانەی (إبرام)ە، (إبرام)، واتە: گرێـدا، (نَقَضَـهُ) واتە: هەڵیوەشـاندەوە.

(مِيثَٰقِهِۦ): (الـمِيْثَـاقُ: عَقْـدٌ مُؤَكَّـدٌ بِيَمِـينٍ عَـهداً) وشـەی (الـمِيْثَاقُ) بریتیـە لـە پـەیمانێکی پتەوکـراو، بـەهۆی ئـەوە کـە سوێندی لەسـەر خـورا بێـت، یـاخود بەڵێنی لەسەر درابێت.

## هـۆی هاتنــە خـوارەوەی ئایەتەکــان

بـۆ هـۆی هاتنـە خـوارەوەی ئـەم دوو ئایەتـەی کـە باسـی وێنـە هێنانـەوە (ضـرب المثل) دەکـەن، زانایان دوو بەسەرهاتیان باس کردوون:

یەکـەم: {(قَـالَ ابـنِ عَبَّـاسٍ: لَمَّـا ضَرَبَ اللهُ سُبحَانَهُ هَذَينِ الـمَثَلَـينِ لِلمُنَـافِقِين: ﴿مَثَلُهُمْ كَمَثَلِ ٱلَّذِى ٱسْتَوْقَدَ نَارًا ...﴾، ﴿أَوْ كَصَيِّبٍ مِّنَ ٱلسَّمَآءِ ...﴾ قـالُوا: الله أعلَـى وأجَـل مِـن أن يَضرِبَ الأمثَـال، فـأنزَلَ الله هَـذِهِ الآيَـةَ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَسْتَحْىِۦٓ أَن يَضْرِبَ مَثَلًا مَّا بَعُوضَةً فَمَا فَوْقَهَا ۚ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ فَيَعْلَمُونَ أَنَّهُ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّهِمْ ۖ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ فَيَقُولُونَ مَاذَآ أَرَادَ ٱللَّهُ بِهَٰذَا مَثَلًا ۘ يُضِلُّ بِهِۦ كَثِيرًا وَيَهْدِى بِهِۦ كَثِيرًا ۚ وَمَا يُضِلُّ بِهِۦٓ إِلَّا ٱلْفَٰسِقِينَ ﴾)

(أسبَاب النزول لِلنيسابوري، ص١٤)}، واتە: عەبدوڵڵای كوڕی عەبباس خوا لە خۆیو بابی ڕازی بێ، دەفەرموێ: كاتێ خوا ئەو دوو وێنەیەی بۆ مونافیقەكان هێنانەوە، كە فەرمووی: ﴿ مَثَلُهُمْ كَمَثَلِ ٱلَّذِى ٱسْتَوْقَدَ نَارًا ... ﴾، وێنەی مونافیقەكان وەك كەسێكە ئاگرێكی كردۆتەوە، ﴿ أَوْ كَصَيِّبٍ مِّنَ ٱلسَّمَآءِ ... ﴾، وەك هەورێك (یان بارانێك) لە ئاسمانەوە، مونافیقەكان گوتیان: خوا لەوە بەرزترە كە وێنە بەو شتانە بێنێتەوە، خوا ﷻ ئەم ئایەتانەی ناردنە خوارێ.

دووەم: {(وقَالَ الحَسَن وقَتَادَة: لَمَّا ذَكَرَ اللهُ الذُبَابَ وَالعَنكَبُوت فِي كِتَابِهِ، وَضَرَبَ بِهِمَا لِلمُشرِكِينَ المَثل، ضَحِكَتْ اليَّهُود وَقَالُوا: مَا يَشبَهُ هَذَا كَلامَ الله، فَأَنْزَلَ اللهُ هَذِهِ الآيَةَ) (أسبَاب النزول لِلنيسابوري، ص١٥)}، واتە: كاتێك خوا لە قورئاندا باسی مێشی كرد، وە باسی جاڵجاڵۆكەی كرد، {كە باسی مێشی كردوە لە سووڕەتی (الحج) ئایەتی (٧٣)داو، فەرموویەتی: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ضُرِبَ مَثَلٌ فَٱسْتَمِعُواْ لَهُۥٓ ۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ تَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ لَن يَخْلُقُواْ ذُبَابًا وَلَوِ ٱجْتَمَعُواْ لَهُۥ ﴾، واتە: ئەی خەڵكینە! خوا وێنەیەكی هێناوەتەوە گوێی بۆ بگرن، ئەوانەی لەجیاتی خوا دەیانپەرستن بە هەموویان كۆبنەوە مێشێك دروست ناكەن، وە ئەگەر مێشەكە شتێكیان لێ بستێنێ بۆیان لێ ناسێنرێتەوە، وە باسی جاڵجاڵۆكەش دەكا لە سووڕەتی (العنكبوت) ئایەتی (٤١)دا، كە دەفەرموێ: ﴿ مَثَلُ ٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَوْلِيَآءَ كَمَثَلِ ٱلْعَنكَبُوتِ ٱتَّخَذَتْ بَيْتًا ... ﴾، واتە: وێنەی ئەوانەی كە غەیری خوا دەپەرستن، وەك جاڵجاڵۆكەیە خانوویەكی دروستكردوە}، جوولەكەكان پێكەنین گوتیان: ئەوە وەك قسەی خوا ناچێ، خوا بەو هەموو عەزەمەتو گەورەیی یەی خۆی چۆن باسی مێشو جاڵجاڵۆكە دەكات؟! بەڵام بێگومان ئەوان نەفام بوون، چونكە ئەو نهێنییەی كە لە (فیل)دا هەیە، بەهەمان شێوە لە جاڵجاڵۆكەو لە مێشیشدا هەیە، كە بریتیە لە نهێنی ژیان (الحیاة)، وە وەك چۆن خەڵك ناتوانن گایەك دروست بكەنو، فیلێكو كەرگەدەنێك دروست

بكەن، بەهەمان شێوە ناشتوانن مێشێكو جاڵجاڵۆكەیەكو مێشوولەیەكیش دروست بكەن، بۆیە خوا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَسْتَحْيِۦٓ أَن يَضْرِبَ مَثَلًا مَّا بَعُوضَةً فَمَا فَوْقَهَا ﴾، خوا شەرم ناكات لەوەی كە وێنە بێنێتەوە، بە مێشوولەیەكو لە سەرووی مێشوولەشەوە، واتە: لە مێشوولەش گچكەتر.

## مانای گشتی ئایەتەكان

خوا ﷻ دوای ئەوەی لە ئایەتەكانی پێشوودا بانگی مرۆڤایەتی كرد كە بەندایەتیی بۆ خوا بكەن، وە باسی پەروەردگاریێتی خۆی بۆیان كرد، وە پاشان فەرمانی پێكردن كە ئیمان بێنن بەوەی كە بۆ سەر بەندەی خۆی دایبەزاندوە، كە قورئانە، وە فەرمووشی ئەگەر لە گوماندان ئێوەش سوورەتێكی وەك قورئان بێنن‌و، دوایی هەڕەشەی لێكردن‌و فەرمووی، ئەگەرنا خۆتان لەو ئاگرە بپارێزن كە سووتەمەنییەكەی خەڵك‌و بەردە، دوای ئەوە ڕوو لە پێغەمبەر ﷺ دەكات‌و دەفەرموێ: وە موژدە بدە بەوانەی كە ئیمانیان هێناوەو كردەوە چاكەكان ئەنجام دەدەن: ﴿ وَبَشِّرِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ﴾، هەمیشە لە قورئاندا (مَفْعُول)ی (آمَنُوا) (مَحْذُوف)ە (آمَنُوا)، (فعل)و (فاعِل)ە، ئیمانیان هێناوە، ئیمانیان بە چی هێناوە؟ بە هەموو ئەو شتانەی كە پێویستە ئیمانیان پێ بهێنرێ، ئیمان بە خوا، ئیمان بە فریشتەكانی، بە كتێبەكانی، بە پێغەمبەرانی، بە ڕۆژی دوایی، بە هەموو ئەو شتانەی كە پێویستە ئیمانیان پێ بهێنرێ، ﴿ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ ﴾، (عَمِلُوا) واتە: ئەنجامیان داوە، ئەویش (فعل و فاعِل)ە، (صَالِحات) سیفەتی مەوصووفێكی (مَحْذُوف)ە، واتە: (الخِصَال الصَالِحات، أو الأعمَالُ الصَالِحات) یانی هەموو ئەو شتانەی كە چاكن، كە مەفهوومەكەی زۆر فراوانەو، هەموو ئەو كردەوانەی كە پەسندو باشن ئەنجامیان داون، یانی: موژدە بدە بەوانەی كە هەم هەقیان ناسیوەو هەم هەقیان لە خۆیاندا بەرجەستە كردوە، هەقیان ناسیوەو قەبووڵیان كردوە، كە ئەوە ئیمانە، وە لە خۆیان پراكتیزەو بەرجەستەیان كردوە،

کە ئەوەش کردەوە چاکەکانن، ﴿ أَنَّ لَهُمْ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ ﴾، موژدەیان پێبدە بە بەهەشت، بە چەند باغێك كە ڕووباریان بە ژێردا دەڕۆن، ﴿ كُلَّمَا رُزِقُوا۟ مِنْهَا مِن ثَمَرَةٍ رِّزْقًا قَالُوا۟ هَٰذَا ٱلَّذِى رُزِقْنَا مِن قَبْلُ وَأُتُوا۟ بِهِۦ مُتَشَٰبِهًا ﴾، واتە: هەرکات شتێکیان لە میوەجاتی بەهەشت بۆ هێنرا، دەڵێن: ئەمە بوو کە پێشتریش پێمان درا، وە ئەوەی بۆیان دێ پێکدەچێ، یانی: باغەکان ئەو میوەجاتەی کە تێیاندایە وێکدەچێ‌و شێوەی یەکدی دەکەن لە ڕەنگدا، بەڵام لە تام‌و بۆندا دیارە لەیەك جیان، یاخود ئەو میوەجاتەی کە لە بەهەشتێدا هەیە، شێوەی میوەجاتی دنیا دەکات، چونکە تەبیعەتی ئینسان لە شتێك دەسڵەمێتەوە کە پێیەوە ڕانەهاتبێ، میوەجاتی بەهەشت شێوەی میوەجاتی دنیا دەکات لەڕووی ڕووواڵەتییەوە، چونکە کاتی خۆی ئولفەتیان گرتوە بەو میوەجات‌و خواردنانەی دنیاوەو، ئەوانەی بەهەشتیش شێوەی دەکەن، وەك عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس دەڵێ: ئەوەی کە خوا باسی کردوە لە نیعمەتەکانی بەهەشت، تەنیا لە ناودا لەگەڵ شتی دنیا تێکدەکەنەوە، دەنا لە نێوەڕۆکدا زۆر لەیەك جیان، دیارە هەرواشە، چونکە خوا ﷻ لە سوورەتی (الزخرف) ئایەتی (١٧)دا دەفەرموێ: ﴿ وَفِيهَا مَا تَشْتَهِيهِ ٱلْأَنفُسُ وَتَلَذُّ ٱلْأَعْيُنُ ﴾، واتە: تێیدا هەیە هەرچی نەفس ئارەزووی بکات‌و چاو لەزەتی لێبکا، وە پێغەمبەر ﷺ لە فەرموودەیەکی قودسییدا فەرموویەتی: {(قَالَ اللهُ ﷻ: أَعْدَدْتُ لِعِبَادِيَ الصَّالِحِينَ مَا لاَ عَيْنٌ رَأَتْ، وَلاَ أُذُنٌ سَمِعَتْ، وَلاَ خَطَرَ عَلَى قَلْبِ بَشَرٍ) (رَوَاهُ مُسْلِمٌ برقم: (٧٠٦٣)، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه}، واتە: خوای زاڵ‌و خاوەن شکۆ دەفەرموێ: ئامادەم کردوە بۆ بەندە چاکەکانم (لە بەهەشتدا) نازو نیعمەتی وا، کە نە هیچ چاوێك بینیویەتی‌و نە هیچ گوێیەك بیستوویەتی‌و نە بە خەیاڵ‌و دڵی هیچ کەسێکیشدا هاتوە، هەر شتێك هەبێت یان بۆخۆت بینیوتە، یان کەسێك بینیویەتی، یان ئەگەر بۆخۆت یان خەڵکیش نەیبینیبی، هەواڵتان بیستوە، دەڵێن: لە فلانە وڵاتە فلانە شت هەیە، یاخود ئەگەر کەسیش هەواڵی نەبیستبێ، بەلای کەمەوە تۆ بە خەیاڵی

خۆتی دا دەهێنی، بەڵام ئەوەی لە بەهەشتدا هەیە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: نە هیچ چاوێك بینیویەتی، نە هیچ گوێیەك بیستوویەتی، نە بەزەین و فیکری هیچ کەسدا هاتوە، واتە ئەوەی کە لە بەهەشتدا هەیە نیعمەتێکی یەکجار بەرزو ناوازەیەو، ئەوە کە خوا ﷻ باسی ڕووباری ئاوو، ڕووباری هەنگوین و، شەڕاب و، شیرو، باسی مۆزو، باسی میوەجاتو، باسی گۆشتی باڵندەو ئەوانە دەکات، لەڕاستیدا لەبەر ئەوەیە کە ئێمە هەر بەو شتانە ئاشناین و ئولفەتمان پێیانەوە گرتوەو ڕاهاتووین، ئەگەرنا ئەوەی کە لە بەهەشتە نەوعیەتەکەی زۆر زۆر جیایە لەگەڵ ئەوەی دنیاو، تەنیا لە ناودا یەکدەگرنەوە، وەك عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس خوای لێ ڕازی بێ، فەرموویەتی: ئنجا باسی ئەو هاوسەرانە دەکات کە بۆیان ئامادەکراون و دەفەرموێ: ﴿ وَلَهُمْ فِيهَآ أَزْوَٰجٌ مُّطَهَّرَةٌ ۖ وَهُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴾، واتە: وە هاوسەرانێکی پاکیزەیان لەوێدا هەن، کە بە هەمیشەیی لەو بەهەشتەدا دەمێننەوە.

دوایی خوای پەروەردگار باسی وێنە هێنانەوە دەکات، کە هۆی هاتنە خوارەوەکەیمان باسکردو دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَسْتَحْىِۦٓ أَن يَضْرِبَ مَثَلًا مَّا بَعُوضَةً فَمَا فَوْقَهَا ﴾، واتە: خوا شەرم ناکا لەوەی وێنە بێنێتەوە بە مێشوولەو گچکەتریش لە مێشووله، بۆچی؟ چونکە هەمووی هەر دروستکراوی خۆیەتی، وە ئەو حیکمەتەی کە خوا لە مێشوولەو لە مێش و جاڵجاڵۆکەدا ڕەچاوی کردوە، بە هەمان شێوەش هەر هەمان حیکمەت لە ئاژەڵ و ژیاندارانی دیکەشدا هەیەو، وەك چۆن ئینسان دەستەوستانە لەبەردەم دروستکردنی فیلێکدا، وەك گوتم، لەبەردەم دروستکردنی مێشوولەیەکیشدا هەر دەستەوستانەو، گرنگیش ئەوەیە خوای کاربەجێ وێنە دێنێتەوە بە هەرکام لە مەخلووقەکانی خۆی بۆئەوەی ئێمە چاکتر لە مەسەلەکان حاڵی بکات، ﴿ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ فَيَعْلَمُونَ أَنَّهُ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّهِمْ ﴾، جا ئەوانەی کە ئیمانیان هێناوە، هەڵوێستیان لەبەردەم وێنە هێنانەوەی خوادا، ئەوەیە کە دەڵێن: ئەوە هەقەو لە پەروەردگارمانەوەیە، بەندە بەرانبەر بە خوای پەروەردگاری خۆی بێجگە لە تەسلیمبوون و بڕواهێنان، هیچ هەڵوێستێکی

دیكەی نیە! ﴿ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فَيَقُولُونَ مَاذَآ أَرَادَ ٱللَّهُ بِهَٰذَا مَثَلًا ﴾، بەڵام ئەوانەی كە بێ بڕوان، سەریان لێ دەرناچێو دەڵێن: خوا مەبەستی چییە لەو وێنەیە؟ دیارە ئینسان هەتا ئیمانی باشتربێ، چاكتر لە خواو لە فەرمایشتی خوا ﷻ حاڵی دەبێتو تێدەگات، بەڵكو ئێمە لە هەڵسوكەوتی نێو خۆشماندا هەر واین، ئینسان تا زیاتر یەكێك بناسێ، زیاتر لە قسەی تێدەگاتو زیاتر پێی ئاشنایە، بەڵكو جاری وا هەیە دوو برادەر كە باش یەكدی بناسن، هەر بە ئاماژەو بە ڕەمز لە قسەی یەكدی تێدەگەن، جا ئەو بەندانەی كە خوا دەناسنو ئیمانیان بە خوا هەیەو لە خوا نزیكن، زۆرچاك لە كەلامو لە وێنە هێنانەوەكانی خوا، وە لە هەموو شتێكی خوا ﷻ حاڵی دەبن، بەڵام بێ بڕوایان لەبەرئەوەی پەردە كەوتۆتە نێوانی ئەوانو خوای پەروەردگارەوەو، دڵیان داپۆشراوە، بۆیە لە فەرمایشتەكەیشی حاڵی نابن! پاشان دەفەموێ: ﴿ يُضِلُّ بِهِۦ كَثِيرًا وَيَهْدِى بِهِۦ كَثِيرًا ﴾، زۆر خەڵكی پێ گومڕا دەكات، وە زۆرخەڵكیشی پێ ڕێنمایی دەكات، دەگونجێ ئەم قسەیە قسەی كافرەكان بێت، وە دەشگونجێ كە ئەوە فەرمایشتی خوا بێت، هەردووك لای گونجاون، بەڵام ئەوە كە دوایی دەفەرموێ: ﴿ وَمَا يُضِلُّ بِهِۦٓ إِلَّا ٱلْفَٰسِقِينَ ﴾، ئەوە فەرمایشتی خوایە، واتە: (خوا) بەو وێنە هێنانەوەیە گومڕا ناكا، جگە لە لادەران، یەكێك بۆی هەیە بپرسێ: چۆن خەڵك بە كەلامی خوا گومڕا دەبێت؟ وەڵامەكەی ئەوەیە ئیمانی پێ ناهێننو گومڕا دەبن، ئەگەرنا كەلامی خوا نابێتە هۆی گومڕابوون، بەڵام هەڵوێستی سەلبیی خراپ لە بەرانبەر فەرمایشتی خوادا، دەبێتە هۆی زیاتر گومڕابوونیان، واتە: كافرەكان بەوە خۆیان كافر كردوە، كە ئیمانیان بە خوا نیەو، كە فەرمایشتەكەیشی دەبیستنو ڕەتی دەكەنەوەو ئیمانی پێ ناهێنن، وە ئەم هەڵوێستە سەلبییەیان، دەبێتە هۆی گومڕاكردنیان، لێتان تێكنەچێ !! ئەگەرنا قورئان كەس گومڕا ناكات، بۆیە خوا دەفەرموێ: ﴿ وَمَا يُضِلُّ بِهِۦٓ إِلَّا ٱلْفَٰسِقِينَ ﴾، تەنیا لادەران، قورئان دەبێتە هۆی گومڕاكردنیان، ئەوانیش كێن؟ خوا ﷻ بە سێ سیفەتان پێناسەیان دەكاو، دیارە لێرەدا مەبەست لە لادەران (فاسقین)، ئەوانەن

كـە بەیـەكجاریی لـە شـەریعەتی خـوا لایانـداوە، یـاخود ئەوانـەن كـە لـە كەوڵـی فـیطـرەتی خۆیـان دەرچـوون، لـە خـوا هەڵـگەڕاونەوەو لـە سروشـتو فـیطـرەتـی خۆشیان هەڵگەڕاونەوە، ئەو سێ سیفەتەش ئەمانەن:

**یەكەم:** ﴿ ٱلَّذِينَ يَنقُضُونَ عَهۡدَ ٱللَّهِ مِنۢ بَعۡدِ مِيثَٰقِهِۦ ﴾، ئەوانـەی پـەیمانی خـوا دوای ئەوەی كە زۆر بە پتەویی لێیـان وەرگیـراوە، هەڵدەوەشێننەوە.

**دووەم:** ﴿ وَيَقۡطَعُونَ مَآ أَمَرَ ٱللَّهُ بِهِۦٓ أَن يُوصَلَ ﴾، وە هەرچـی خـوا ﷻ فـەرمانی بـە گەیاندنی كردوە دەیپچڕێنن، ئینسان كە پەیوەندی لەگەڵ خـوا پچڕاو خیانەتی بە خوا كـردو پەیمانی خوای هەڵوەشـاندەوە،ئەو پەیمانەی كە خوا لە فیطرەتو لە سروشـتی وەریگرتوە، پەیمانو بەڵێنی ئەوە كە دەبێت تەنیا خوا بپەرسـترێو بەندایەتی بۆ بكرێ، كە خوا لە هەموو ئینـسانێكی وەرگرتـوە، وەك دەفـەرموێ: ﴿وَإِذۡ أَخَذَ رَبُّكَ مِنۢ بَنِيٓ ءَادَمَ مِن ظُهُورِهِمۡ ذُرِّيَّتَهُمۡ وَأَشۡهَدَهُمۡ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمۡ أَلَسۡتُ بِرَبِّكُمۡۖ قَالُواْ بَلَىٰ شَهِدۡنَآۚ أَن تَقُولُواْ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ إِنَّا كُنَّا عَنۡ هَٰذَا غَٰفِلِينَ ﴿١٧٢﴾﴾ الأعراف، واتە: كاتێك خوا لە پشتی ڕۆڵەكـانی ئادەم وەچەی ئادەمی وەرگـرت، وە لەسەرخۆیانی كردنە شـایەد (فەرمووی): ئایا پەروەردگـارتان نـیم؟ گوتیـان: بـا، (تۆ پەروەردگارمانی) شایەدییمـاندا، ئەوەش بۆ ئەوەبوو كە ڕۆژی قیامـەت نەڵێن ئێمە لەمە بێئاگـا بـووین، توێـژەرانی قورئـان دەڵـێن: ئـەوە تەصـویرێكو وێنـە هێنانەوەیەكە بۆ ئەوە كە خوا ﷻ مرۆڤەكانی وا دروستكردوە كە پەروەردگـاری خۆیـان بناسـنو، وەك ڕووبـەڕوو پـەیمانی لـێ وەرگـرتبن وایـە، ئنجـا ئـەوان كـە پەیمانی خۆیان هەڵوەشاندبێتەوە سەرەنجام پەیوەندییە كۆمەڵایەتییەكانیشیان دەپچڕن، وەك: پەیوەندیی خزمایـەتییو ڕەفاقـەت، دراوسـێیەتی... هتـد، واتـە: لە ئەنجامی خراپبوونیان لەگەڵ خوادا، لەگـەڵ خەڵكیشدا خراپ دەبن.

**سێیەم:** ﴿ وَيُفۡسِدُونَ فِي ٱلۡأَرۡضِ ﴾، وە سەرەنجام خراپەكارییو ئاشووب لە زەویدا بڵاودەكەنەوە ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡخَٰسِرُونَ ﴾، بێگومان ئەوانەن زیـان باران.

## چەند مەسـەلەیەکی گرنـگ

**مەسەلەی یەکەم:** ئیمان و کردەوە هیچ کاتێك ناگونجێ لێك بترازێن، بۆیە لە قورئاندا لە شەست شوێن زیاتر ئیمان و کردەوەی چاك بەیەکەوە باسکراون، بەڵێ ئەگەر ئیمان ئیمان بێت، خاوەنەکەی وا لێدەکات کە کردەوەی باش ئەنجام بدات و، مەحاڵە ئیمانی ڕاستەقینە لە دڵی ئینساندا هەبێ و خاوەنەکەی وا لێنەکات کە کردەوەی باش ئەنجام بدا، چونکە ئەگەر بەڕاستی ئینسان خوای خۆشبوێ و لە خوا بترسێ و شەرمی لێبکات لە دەروونەوە، بێگومان جەستەو ئەندامەکانیشی بۆ خوا فەرمانبەر دەبن فەرمانەکانی جێبەجێ دەکەن.

**مەسەلەی دووەم:** خوا ﷻ کە باسی بەهەشت دەکات بە زۆری باسی باغ و باغات و کانی و کانیاو ڕووبار دەکات، چونکە لەڕاستیدا ئەوەی کە ئینسان زۆر دڵی پێ بپشکوێ وە سەرچاوەی ژیانە، بریتیە لە ئاو وە پاشان بریتیە لە سەوزایی و باغ و باغات و ئەوانە ... وە ئەو زانایانەی کە لە ڕووی پزیشکیی و دەروونییشەوە دەکۆڵنەوە دەڵێن: هیچ شتێك بەقەد دیمەنی ئاو دیمەنی باغ و مێرگ و سەوزایی، دڵی ئینسان ناپشکوێنێ، وە لە هەموو ڕەنگەکان زیاتر ڕەنگی شین و ئاوی، وە ڕەنگی سەوز دڵی ئینسان دەپشکوێنێ، وە کاریگەریی ئیجابیی دەکاتە سەر دەروونی ئینسان، هەر بۆیەش خوای پەروەردگار ڕەنگی سەوزو شینی زۆر کردوە، هەم ڕەنگی ئاوو هەم ڕەنگی ئاسمان و هەم ڕەنگی باغ و باغات.

**مەسەلەی سێیەم:** خوا کە باسی هاوسەرانی بەهەشت دەکات، دەفەرمویَ: ﴿ وَلَهُمْ فِيهَآ أَزْوَاجٌ مُّطَهَّرَةٌ ﴾، وە بۆیان هەن هاوسەرانی پاکیزەو پاککراوە، هەڵبەتە هەر ئافرەتان پاککراوە نین، بەڵکو پیاوەکانیش هەروان، ئنجا ئایا لەچی پاککراوەن؟! پێغەمبەر ﷺ لە فەرمایشتێکدا باسی کردوەو فەرموویەتی: {عَن جَابِرِ بن عبدالله رَضِيَ اللهُ عَنْهُ سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقولُ: {(إنَّ أهْلَ الجَنَّةِ يَأكُلُونَ فِيهَا وَيَشْرَبُونَ، وَلاَيَتْفِلُونَ وَلاَيَبُولُونَ وَلاَيَتَغَوَّطُونَ وَلاَ

يَمْتَخِطُونَ))، قَالُوا: فَمَا بَالُ الطَّعَامِ والشَّرَابِ؟! قَالَ: جُشَاءٌ وَرَشْحٌ كَرَشْحِ المِسْكِ، يُلْهَمُونَ التَسْبِيحِ والتَحمِيدِ، كَمَا تُلْهَمُونَ النَّفَسَ} (رَوَاهُ مُسْلِم برقم: (٧٠٨١)، واتە: جابرى كوڕى عەبدوڵڵا دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەرى خوا بوو ﷺ كە دەيفەرموو: ئەهلى بەهەشت دەخۆن و دەخۆنەوە، بەڵام نە تفيان هەيە، نە ميزيان هەيە، نە پيساييان هەيە، نە بەڵغەم و چڵميان هەيە، گوتيان: ئەدى ئەو خواردن و خواردنەوەى دەيخۆن چى لێدێ؟ فەرمووى: دەبێتە قرپ و ئارەقە، وەك بۆنى ميسك وايە (كە قرپيان دێتەوە، وە ئەو ئارەقەى كە لە بەدەنيان دەردەچێ، بۆنەكەى وەك ميسكە كە خۆشترين بۆنە) وە خوا بەپاك دەگرن و ستايشى دەكەن، وەك چۆن ئێوە هەناسە دەدەن، بەبێ ماندووبوون. ديارە ئەو حاڵەتانەى بۆ ئەهلى دنيا هەن لە ژيانى دنيادا وەك هەبوونى پاشەڕۆك و ئەو كەموكوڕيیانەى ديكە كە هەن، زادەى ئەو جەستە ماددیەن كە بۆ دنيا دروستكراوە، بەڵام لە بەهەشتدا ئەهلى بەهەشت بە پياو و ئافرەتەوە، ڕووحێكى زۆر پاكيان دەبێت و جەستەيەكى زۆر پتەو چاكيشيان دەبێت، كە ئەو كەموكوڕيیانەى كە لە ڕووح و جەستەى دنيادا پەيدا دەبن، لەوێ پەيدا نابن.

**مەسەلەى چوارەم:** دەربارەى ئافرەتانى بەهەشت و ئافرەتانى دنيا پرسيار كراوە لە پێغەمبەر ﷺ ئايا كاميان چاكترو ڕێكترو جوانترن؟ لەوبارەوە بە پێويستى دەزانم ئاماژە بە فەرمايشتێكى پێغەمبەر ﷺ بكەم: {عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ نِسَاءَ الدُّنيا أَفْضَلُ أَمْ الحُورِ العِينِ؟ قَالَ: (بَلْ نِسَاءُ الدُّنيا أَفْضَلُ مِنَ الحُورِالْعِينِ كَفَضْلِ الظِّهَارَةِ عَلَى البِطَانَةِ)، قُلْتُ: يَا رَسُولُ اللهِ وَ بِمَ ذَلِكَ؟ قَالَ: (لِصَلاَتِهِنَّ وَصِيامِهِنَّ وَعِبَادَتِهِنَّ للهِ ﷻ) (رَوَاهُ التِّرمِذِيُّ)}، واتە: ئوممو سەلەمە (دايكى ئيمانداران و خێزانى پێغەمبەر ﷺ خوا لێى ڕازى بێت) دەڵێ، گوتم: ئەى پێغەمبەرى خوا ئافرەتانى دنيا چاكترو ڕێكترو جوانترن، ياخود حۆريەكانى بەهەشت (كە خوا بەتايبەت بۆ پياوانى ئيماندارانيان دەخوڵقێنێ)؟ فەرمووى: ئافرەتانى دنيا لە حۆرییەكان چاكترن، وەك چۆن پشتى پۆشاكێك لە بەرەكەى چاكترە (پشتى پۆشاك عادەت وايە

دیوە جوانەكەی دەكرێتە پشتو دیوەكەی دیكەی دەكرێتە دیوی نێوەوەی) دەڵێ، گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوە بۆچی وایە؟ فەرمووی: بەهۆی نوێژو ڕۆژووو پەرستنیان بۆ خوای زاڵی پایە بەرز. (بەڵام ئەو ئافرەتانەی كە خوا بەتایبەت دەیانخولقێنێ لە بەهەشت وەك ئافرەتانی دنیا ماندوو نەبوون بە طاعەتو عیبادەتو بەندایەتی بۆ خوا كردنەوە).

**مەسەلەی پێنجەم:** لێرە ئیشكالێك لە دڵی هەندێ كەسدا دروست دەبێ، كە ئایا بۆچی خوا ﷻ باسی ئافرەتانی جوانو پاكیزەو باسی حۆریەكان دەكات بۆ پیاوانی ئیماندار، بەڵام لە بەرانبەردا باسی پیاوان ناكات بۆ ئافرەتان؟ وەڵامەكەی ئەوەیە كە خوا ﷻ بەپێی فیطرەتو، سروشتی ئینسان قسە دەكاتو سروشتی پیاویش ئاوایە كە داواكار (طالب)ە، بەڵام سروشتی ئافرەت ئەوەیە كە حەز دەكات داواكراو (مطلوب) بێت، واتە: پێچەوانەی سروشتی ئافرەتە كە بڵێی پیاوی جوانیان بۆ داناوی لە بەهەشتێ!! ئافرەت دەبێ پیاو داوای بكات، نەك داوای پیاوان بكات، كەواتە لەبەر ئەو حاڵەتە سروشتیو دەروونییەیە، كە باسی پیاوانی بەهەشت بۆ ئافرەتان ناكرێ.

**مەسەلەی شەشەم:** ئایا ئافرەتانی ئیماندار لە بەهەشت دەبنە هاوسەری كێ؟ بێگومان ئافرەتانی ئیماندار دەبنە هاوسەرانی پیاوانی ئیماندار، وە وەك چۆن خوا ﷻ ئافرەتانی ئیماندار چاكو جوانو ڕێكوپێك دەكا، دیارە پیاوانی ئیماندااریش بۆ هاوسەرەكانیان بەهەمان شێوە چاكو پاكو جوان دەبن.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی حەوتەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان دوو ئایەتی ژمارە (٢٨ و ٢٩) لە سوورەتی (البقرة) دەگرێتە خۆی، کە باسی ئەوە دەکەن کوفر شتێکی نا مەنتیقییە، وە ئیمان شتێکی بەڵگەدارە، بەڵێ لەم دوو ئایەتەدا خوای کاربەجێ دەیخاتە ڕوو، کە کوفر شتێکی نامەنتیقییەو هیچ بەڵگەی لەسەر نییەو، پێچەوانەی عەقڵو پێچەوانەی فیطرەتە، بەڵام بە پێچەوانەوە ئیمان، پشت ئەستوورە بە بەڵگەی بەهێزو، بەڵگەی عەقڵیی و عیلمیی، وە بەڵگەی فیطرەتو سروشتی ساغی ئینسان.

﴿ كَيْفَ تَكْفُرُونَ بِٱللَّهِ وَكُنتُمْ أَمْوَٰتًا فَأَحْيَٰكُمْ ثُمَّ يُمِيتُكُمْ ثُمَّ يُحْيِيكُمْ ثُمَّ إِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴿٢٨﴾ هُوَ ٱلَّذِى خَلَقَ لَكُم مَّا فِى ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا ثُمَّ ٱسْتَوَىٰٓ إِلَى ٱلسَّمَآءِ فَسَوَّىٰهُنَّ سَبْعَ سَمَٰوَٰتٍ وَهُوَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ ﴿٢٩﴾ ﴾

## مانای وشە بە وشەی ئایەتەکان

((چۆن بێ بڕوا دەبن بە خوا، لەحاڵێکدا کە ئێوە بێ ژیان بوونو مردوو بوونو خوا کردنیە ژیاندار، پاشان دەتانمرێنێ، دوایش زیندووتان دەکاتەوەو، سەرەنجام بۆ لای وی دەگێڕدرێنەوە ﴿٢٨﴾ ئەو کەسێکە کە ئەوەی لە زەویدایە هەمووی بۆتان هێناوەتە دی، پاشان ڕووی ئیرادەی کردە ئاسمانو حەوت ئاسمانی ڕێکوپێکی بنیاتنان، وە ئەو بە هەموو شتێك زانایە ﴿٢٩﴾)).

## شیکردنەوەی هەندێك لە وشەكان

(تَكْفُرُونَ): واتە بێ بڕوا دەبن، كوفر دەكەن (الكُفرُ في اللُّغَةِ: سَتْرُ الشَّيء، وَوصْفُ اللَّيْلِ بالكَافِرِ لِسَتْرِهِ الأشخَاص) وشەی كوفر لەڕووی زمانەوە بە داپۆشینی شت دەگوترێ، وە وەسفی شەوگار بە كافر دەكرێ، چونكە هەموو شتان دادەپۆشێ، وە بابای جووتیار دیسان بە كافر ناوبراوە، لە قورئاندا (يُعجِبُ الكُفَّارَ نَبَاتُهُ)، كە (كُفَّار) بەمانای (زُرَّاع)ە، چونكە ئەویش ئەو تۆوە كە دەیچێنێ، یاخود ئەو نەمامە كە دەینێژێ، لەبن زەویدا پەنهانی دەكاتو دایدەپۆشێت.

(أَمْوَاتًا): (أَمْوَات) كۆی (مَيِّت)ە، (المَيِّت عَكسُ الحَي) واتە: مردوو پێچەوانەی زیندووە، (مَيِّت) بە شەددە یاخود بێ شەددە، واتە: مردوو.

(فَأَحْيَاكُمْ): واتە: زیندووی كردنەوە، وە ژیان چەند قۆناغێكە (حَياة النَّبَات، وحَياة الحَيوان، وحَياة الإنسان، وحَياة الجن، وحَياة الملائكَة، وحَياة الأخرة، وحَياة الله تعالى)، واتە: ژیانی ڕووەكو، ژیانی ئاژەڵو، ژیانی ئینسانو، وە ژیانی جنو، ژیانی مەلائیكەو، ژیانی خوای بەرز، كە بێگومان تەواوترین ژیانە.

(اسْتَوَىٰ): واتە: ڕێكوپێك بوو. وشەی (استَوَى) ئەگەر بە (عَلَى) تەعەددا بكا، وەك: (إستوى عَلَى العَرش) واتە: چووە سەر عەرش، بەرز بۆوە بۆ سەر عەرش، بەڵام ئەگەر بە (إلى) تەعەددا بكات وەك: (استوى إلى السَّماء)، واتە: (قَصَدَ إلى السَّماء) ڕووی كردە ئاسمان، كەواتە: ﴿ ثُمَّ اسْتَوَىٰ إِلَى السَّمَاءِ ﴾، واتە: ئنجا ڕووی ئیرادەی خۆی كردە ئاسمان، تاكو ئاسمان دروست بكات.

(ٱلسَّمَآءِ): (سَمَاءُ كُلُّ شَيءٍ أَعْلَاهُ)، واتە: ئاسمانی هەر شتێك لای سەرەوەیەتی، بۆیە لە قورئاندا بە سەقفی خانوو گوتراوە: ئاسمان، وەك خوای بەرزو مەزن لە سوورەتی (الحج) ئایەتی (١٥)دا، دەفەرموێ: ﴿ مَن كَانَ يَظُنُّ أَن لَّن يَنصُرَهُ ٱللَّهُ فِي ٱلدُّنْيَا وَٱلْأٓخِرَةِ فَلْيَمْدُدْ بِسَبَبٍ إِلَى ٱلسَّمَآءِ ثُمَّ لْيَقْطَعْ فَلْيَنظُرْ هَلْ يُذْهِبَنَّ كَيْدُهُۥ مَا يَغِيظُ ﴾، واتە: كەسێك پێی وایە خوا سەری ناخات لە دنیاو دوارۆژدا با گوریسێك (یاخود پەتێك) بێنێ بە سەقفی خانووەكەی خۆی پێ هەڵواسێو خۆی پێ بخنكێنێ، ئنجا با سەرنجبدا ئایا فێڵەكەی ئەوەی پێی ناخۆشە لایدەبات؟ وە (سَمَآء) بە هەوریش گوتراوە: (أَنزَلَ مِنَ السَّمَآءِ) چونكە ئەویش لە سەرووتەوەیە، هەروەها بە حەوت ئاسمانەكانیش دەگوترێ: (سَمَآء).

(فَسَوَّىٰهُنَّ): واتە: ڕێكی خستن، دروستی كردن بە ڕێكوپێكی، (تَسْوِيَةُ الشَّيءِ: جَعَلَهُ سَوَاءًا) واتە: (تَسْوِيَةُ)كردنی شتێك، یانی: ڕێكوپێككردنی.

## مانای گشتی ئایەتەكان

خوا ﷻ ڕوو لە ئەهلی كوفر دەكاتو دەفەرموێ: ﴿ كَيْفَ تَكْفُرُونَ بِٱللَّهِ ﴾، چۆن بەرانبەر بەخوا بێبڕوا دەبن، وشەی: (كَيْفَ) پرسیاری پێ دەكرێ دەربارەی چۆنیەتی شت، وشەی: (كَمْ) پرسیاری پێ دەكرێ دەربارەی چەندێتی شت، وە وشەی: (أين) دەربارەی لەكوێ بوونی شت، وە وشەی: (مَتى) دەربارەی كاتی شت ﴿ كَيْفَ تَكْفُرُونَ بِٱللَّهِ ﴾، واتە: چۆن چۆنی؟ لە چ ڕوویەكەوەو بەچ بەڵگەیەكو بە چ عەقڵێك بێبڕوا دەبن بەرانبەر بە خوا ﴿ وَكُنتُمْ أَمْوَٰتًا فَأَحْيَـٰكُمْ ﴾، واتە: ئێوە نەبوونو پەیدای كردوون، ئاخر بەڕاستیش سەیرە! ئینسان كاتێك بووە كە نەبووە، وەك لە سەرەتای سوورەتی (الإنسان)دا دەفەرموێ: ﴿ هَلْ أَتَىٰ عَلَى ٱلْإِنسَـٰنِ حِينٌ مِّنَ ٱلدَّهْرِ لَمْ يَكُن شَيْـًٔا مَّذْكُورًا ۝١ ﴾، واتە: ئایا بەسەر

ئینساندا نەهاتوە ماوەیەك لە كات كە شتێكی باسكراو نەبووە، واتە: وەك پێشینان دەڵێن: ناوی لە كوولەكەی تەڕیشدا نەبووە، ئینسان كاتێ بووە نەبووە، دوایی پەیدا بووە، كەواتە: ئەو كەسەی تۆی دروستكردوە، چۆن دەبێت بەرانبەری بێ بڕوا بی، ئەگەر دەشڵێی: كەس پەیدای نەكردووم، ئەوە خوا لە سوورەتی (الطور) لە ئایەتی (٣٥)دا دەفەرموێ: ﴿ أَمۡ خُلِقُواْ مِنۡ غَيۡرِ شَيۡءٍ أَمۡ هُمُ ٱلۡخَٰلِقُونَ ﴾، واتە: ئایا كەس دروستی نەكردوون، یان بۆ خۆیان خۆیان دروستكردوەو لە خۆوە پەیدابوون؟ جارێ ئینسان ناتوانێ خۆی پەیدا بكات، چونكە تۆ كە بوونت نەبێ، چۆن بوون دەبەخشی؟! دیارە ئەوە مەحاڵە، ئنجا ناشگونجێ كەس پەیدای نەكردبێ، چونكە یاسایەكی عەقڵیی هەیە، هەموو عاقڵمەندانی دنیا لەسەری یەك دەنگن كە (یاسای هۆكاریی) پێ دەڵێن‌و دەڵێ: هەرشتێ كە پەیدابووبێ، دەبێ پەیداكەرێكی هەبێ، كەواتە: تۆ كە پەیداكراویو خۆشت خۆت پەیدا نەكردوەو كەسی دیكەش پەیدای نەكردووی، غەیری خوا، كەواتە: چۆن بەرانبەر بەخوا بێبڕوا دەبی، لە كاتێكدا كە تۆ نەبووی، پەیدای كردوویو ژیانی پێ بەخشیوی!

﴿ ثُمَّ يُمِيتُكُمۡ ثُمَّ يُحۡيِيكُمۡ ﴾ دوایی جارێكی دیكە دەتانمرێنێ، پاشان جارێكی دی دیسان زیندووتان دەكاتەوە، واتە تۆ نەژیانت بەدەست خۆتەو نە مردنت، نە هاتنت نە ڕۆیشتنت، بەڵكو خاوەنێكت هەیەو، بەرانبەر بەو خاوەنەی خۆت نابێ سپڵە بیو نابێ بێبڕوابی! ﴿ ثُمَّ إِلَيۡهِ تُرۡجَعُونَ ﴾، دوای زیندووكرانەوەش دەچنەوە بۆ بەر قاپی دادگای لێپرسینەوەی ئەو، دوایی خوا ﷻ بەڵگە دێنێتەوە لەسەر پەروەردگاریتی خۆیو دەفەرموێ: ﴿ هُوَ ٱلَّذِي خَلَقَ لَكُم مَّا فِي ٱلۡأَرۡضِ جَمِيعٗا ﴾، واتە: خوا وەنەبێ هەر ئێوەی پەیدا كردبێو لێتان گەڕابێ، بەڵكو هەرچی پێویستیشتانە لەسەر زەویدا بۆی دروستكردوونو هەرچی لە زەویدایە هەمووی ئەو بۆی دروستكردوون، وەك لە شوێنێكی دیكەدا دەفەرموێ: ﴿ قُلۡ أَرَءَيۡتُمۡ شُرَكَآءَكُمُ ٱلَّذِينَ تَدۡعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَرُونِي مَاذَا خَلَقُواْ مِنَ ٱلۡأَرۡضِ أَمۡ لَهُمۡ شِرۡكٞ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ أَمۡ ءَاتَيۡنَٰهُمۡ كِتَٰبٗا فَهُمۡ عَلَىٰ بَيِّنَتٖ مِّنۡهُۚ بَلۡ إِن يَعِدُ ٱلظَّٰلِمُونَ بَعۡضُهُم بَعۡضًا إِلَّا

غُرُورًا ﴿٤٠﴾ ﴾ فاطر، واتە: پێشانم بدەن ئەو هاوبەشانەتان کە لەجیاتی خوا لێیان دەپاڕێنەوە (و دەیانپەرستن) چییان لە زەویدا دروستکردوە، (پەڕە مریشکێك، نەمامێك، ڕووەکێك، دارێك، بەردێك، چی؟) ﴿ أَمْ لَهُمْ شِرْكٌ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ ﴾، یان بەشدارییان کردوە لە دروستکردنی ئاسمانەکاندا؟ بێگومان نە لە زەویدا هیچیان خوڵقاندوە، نە لە ئاسمانو هەر خوایە کە کارسازی ئاسمانو زەوییەو نیعمەتەکانی زەویو ئاسمان هەر خوا فەراهەمی هێناون، کەواتە: پێویستە بەندایەتییش بەس بۆ وی بکرێ: ﴿ هُوَ ٱلَّذِي خَلَقَ لَكُم مَّا فِي ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا ثُمَّ ٱسْتَوَىٰٓ إِلَى ٱلسَّمَآءِ ﴾، دوایی ویستی ئاسمان دروست بکات، ﴿ فَسَوَّىٰهُنَّ سَبْعَ سَمَٰوَٰتٍ ﴾، لە شێوەی حەوت ئاسماناندا ڕێکی خستو بنیاتی نان. ﴿ وَهُوَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ ﴾، وە ئەو بە هەموو شتێکیش زانایە.

## چەند مەسەلەیەکی گرنگ

**مەسەلەی یەکەم:** دەربارەی ئەوە، کە دەفەرموێ: ﴿ كَيْفَ تَكْفُرُونَ بِٱللَّهِ وَكُنتُمْ أَمْوَٰتًا فَأَحْيَٰكُمْ ﴾ ئەوە دەگەیەنێت کە کوفرو بێ بڕوایی شتێکی نامەنتیقییەو شتێکی بێ بەڵگەیەو بێ پاساوەو، ئینسان کە کافر دەبێ پاڵ ناداتە پاڵ هیچ بەڵگەیەكو پشت ئەستوور نیە بە هیچ شتێك نە عەقڵ تەئیدی دەکا، نە عیلم تەئیدی دەکا، نە فیطرەتو سروشت تەئیدی دەکا، نە واقیعی بوونەوەرو ژیان پشتگیریی دەکا، هیچ شتێك پشتگیریی ناکا، وە سەرباری هەموو شتێکیش وەحی خوای کاربەجێش دیسان دژی کوفرە، کەواتە: لەڕاستیدا کوفر شتێکی بێ پاساوەو شتێکی بێ پشتو پەنایە.

**مەسەلەی دووەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ وَكُنتُمْ أَمْوَٰتًا ﴾، دوو مانای هەن:

**یەکەم:** یانی: ئێوە نەبوو بوون (كُنْتُم مَعْدُومِين)، وە خوا پەیدای کردن.

**دووەم:** مانایەکی دیکەی ئەوەیە کە ئێوە ئەو کاتە لە شێوەی (نُطْفَة)دا بوون، یاخود لە شێوەی خوێن دابوون، خوێنی دایكو بابتان، چونکە ئاوی پیاوو ئافرەت لە خوێن دروست دەبێ، خوێنیش دیارە لە خواردنی هەزمکراو دروست دەبێ، واتە: ئەو کاتە ژیانتان نەبووە ﴿ فَأَحْيَٰكُمْ ﴾، بەڵام خوا ژیانی پێداونو ڕووحی بەبەردا کردوون، هەردوو ماناکە هەر ڕاستن.

**مەسەلەی سێیەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ ثُمَّ يُمِيتُكُمْ ثُمَّ يُحْيِيكُمْ ﴾، واتە: دەتانمرێنێ، پاشان زیندووتان دەکاتەوە، لەبەرئەوەی دوایی دەفەرموێ: ﴿ ثُمَّ إِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴾، واتە: ئنجا بۆ لای وی دەگێڕرێنەوە، دەگونجێ مەبەست پێی ژیانی بەرزەخ بێت، کەواتە: ئەو ژیانو زیندووکرانەوەیە دەبێ جیابێ لەو گەڕانەوەیە، ژیانەکە دیارە ژیانی بەرزەخەو گەڕانەوەکەش لە قیامەتتدا دێتە دی، وە ئەوە کە بەناوی (تناسخ الأرواح)ەوە باسکراوە، شتێکی پووچەو هیچ بنەمایەکی نیە، تەناسوخی ئەرواحیش ئەوەیە کە بەشێك لە هیندەکانو هەندێك لە میللەتانی ڕۆژهەڵاتی ئاسیا بڕوایان پێیەتیو دەڵێن: ئینسان کە دەمرێ ڕووحەکەی دەچێتە بەر مەخلووقێکی چاك، بۆ وێنە: دەچێتە بەر کۆترێك بەرکەوێك، ئەوە ئەگەر کەسێکی چاك بووبێ! وە ئەگەر خراپ بووبێ ڕووحەکەی دەچێتە بەر مەخلووقێکی خراپ، وەك سەگێك، گورگێك! بەڵام لەڕاستیدا ئەو بیرۆکەیە خورافەیەو ئەسڵو ئەساسێکی نیە، وە ڕاستی ئەوەیە کە ئینسان دوای ئەوەی دەمرێ، (وەك دوایی لە تەفسیری ئایەتەکانی دیکەدا باسی دەکەین) ئەگەر چاکەکار بێت ڕووحەکەی دەچێتە بەهەشتو، ئەگەر خراپەکاریش بێت ڕووحەکەی دەچێتە دۆزەخ، چونکە خوا ﷻ جگە لەم ژیانی دنیایە، بەس بۆی باسی بەهەشتو دۆزەخ کردووینو، ئینسان کە لەم ژیانە دنیاییەدا نامێنێ، ڕووحەکەی (ئەگەرنا جەستەکەی دەبێتەوە خاك)، ئەگەر چاکەکار بێت، دەچێتە بەهەشت هەرکەس بەپێی ئیمانو تەقوای خۆیو، ئەگەر خراپەکار بێت، دەچێتە دۆزەخ، ئەدی جیاوازی چییە لەگەڵ قیامەت؟! جیاوازییەکە ئەوەیە کە لە قیامەتێ خەڵك بە ڕووحو جەستەوە دەچنە

بەهەشت یان دۆزەخ، بەڵام ژیانی بەرزەخ تەنیا بۆ ڕووحەکەیە، وە ئەوە کە پێغەمبەر ﷺ باس دەکات کە گۆڕ باغێکە لە باغەکانی بەهەشت، یاخود چاڵێکە لە چاڵەکانی دۆزەخ، واتە: ژیانی دوای گۆڕ، ئەگەرنا خودی گۆڕەکە مەرج نیە وابێ، هەرچەندە هەندێك لە زانایانیش دەڵێن: خودی گۆڕەکەش بۆخۆی وایە، بەڵام بێگومان فەرموودەکەی پێغەمبەر ﷺ مەبەست پێی ژیانی دوای گۆڕە، واتە: ئەو قۆناغەی ژیان کە لە دوای ڕووح کێشانەوە دەستپێدەکات، جا ئەوکاتە یەکسانە جەستەی مرۆڤ بخرێتە گۆڕەوە، یان نەخرێتە گۆڕەوەو، بسووتێنرێ، یان ببێتە خۆراکی دڕندەکان، یان ماسیو نەهەنگەکان !

**مەسەلەی چوارەم:** کە دەفەرمووێ: ﴿ هُوَ ٱلَّذِى خَلَقَ لَكُم مَّا فِى ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا ﴾ ، ئەم ڕستە قورئانییە ئەوە دەگەیەنێ، کە هەرچی لە زەویدا هەیە بە ڕەوا (مباح) لەقەڵەم دەدرێ، وە هەرچی لە زەویدایەو بە پاك لەقەڵەم دەدرێ، وە هەرچی لە زەویدایە سوودبەخشە، ئینسان دەتوانێ سوودی لێ ببینێو لێی بەهرەمەند بێت، مەگەر بە بەڵگەیەکی شەرعیی ڕوون جیاکرابێتەوەو دیاری کرابێ کە حەرامە، وەك: مەی (خمر)، یان بە بەڵگەیەکی شەرعیی ڕوون ڕاگەیەنرابێ کە پیسە، وەك میزو پیسایی، یاخود بە بەڵگەیەکی عەقڵیی دەرخرابێت کە زیانی هەیەو سوودی نیە.

مەبەستم ئەوەیە کاتێك خوا دەفەرموێ: ئەوەی کە لە زەویدایە هەموویم بۆتان خوڵقاندوە، کەواتە: هەمووی چاكو پاكو حەڵاڵە، مەگەر ئەوەی بە بەڵگە هەڵاوێررابێو جیاکرابێتەوە، ئەگەرنا خوا نەیدەکردە منەت بەسەر ئێمەوەو وەك نیعمەتێك باسی بکات، دیارە لەم ئایەتەو هاووێنەکانیشی زانایان ئەو بنچینە شەرعییانەیان وەرگرتوون، کە دەڵێن: (الأَصْلُ فِي الأَشيَاءِ الإِبَاحَةَ)، (الأَصْلُ في الأَشيَاءِ الطَّهَارَة) (الأَصْلُ في الأَشيَاءِ الحِلّية). واتە: (بناغە لە شتاندا ڕەوایی یە)، (بناغە لە شتاندا پاکی یە)، (بناغە لە شتاندا حەڵاڵی یە).

**مەسەلەی پێنجەم:** ئەوەی کە خوای پەروەردگار لە زەویدا خوڵقاندوویەتی بۆ هەموو لایەکە بە یەکسانییو، کەس لە کەس زیاتر بەشی پێوە نیە، چونکە

وشەی (جَمِيعًا) دەگونجێ پەیوەست (متعلّق) بێت بە: هەرچی لە زەویدایە ﴿مَّا فِى ٱلْأَرْضِ﴾ەوە، وە دەگونجێ (متعلق) بێ بە: بۆ ئێوە ﴿لَكُم﴾ەوە، جا ئەگەر وشەی (جَمِيعًا) پەیوەست بێ بە ﴿مَّا فِى ٱلْأَرْضِ﴾یەوە، ئەوکاتە مانای ڕستەکە ئاوای لێدێ: خوا ئەو کەسەیە کە هەرچی لە زەویدایە بۆ ئێوەو لەبەر بەهرەمەندبوونی ئێوەی دروست کردوە، کەواتە: هەموو شتێك ڕەوایە.

وە ئەگەر (جَمِيعًا) پەیوەست بێ بە ﴿لَكُم﴾ەوە، ئەوکاتە ماناکەی ئاوای لێدێ: خوا ئەو کەسەیە کە هەرچی لە زەویدایە بۆ تێکڕاتان دروستی کردوەو بە یەکسانیی بۆ هەمووانی خوڵقاندوەو کەس لە کەسی زیاتر بەش پێوە نیە، بۆیە فیکرەی سەرمایەداریی، کە مایەی چینایەتیی و قڕیی‌وپڕیی یەو، مایەی ئەوەیە کە هەندێك لە خەڵکی پڕبن‌و لەسەریانەوە بڕژێ‌و، زۆربەی خەڵکیش قڕبێ‌و لەبەریان ببڕێ! پێچەوانەی بنچینەیەکی گەورەی ئیسلامییە، وە پێچەوانەی ئەو حیکمەتەشە کە خوا هەموو بوون‌و کائیناتی، بۆ ئەوە هێناوەتەدی کە ئینسانی تێدا تاقی بکرێتەوە.

**مەسەلەی شەشەم:** کە خوای تاك‌و پاك دەفەرموێ: ﴿ثُمَّ ٱسْتَوَىٰٓ إِلَى ٱلسَّمَآءِ﴾، هەندێك لە توێژەرەوانی قورئان کردوویانە بە بەڵگە لەسەر ئەوە کە ئاسمان لەدوای زەوی دروست کراوە، بەڵام لەڕاستیدا ئەوە لەوبارەوە بە بەڵگە ناشێ، لەبەرچی؟ چونکە وشەی ﴿ثُمَّ﴾، لێرەدا بۆ ڕیزبەندیی هەواڵدان (ترتيب الإخبار)ە، واتە: خوای کاربەجێ هەواڵمان پێدەدا کە زەوی خوڵقاندوە، دوایی هەواڵیشمان پێدەدا کە، ویستی ئاسمانیش بخوڵقێنێ، بەڵام ئەوە کە کامیان لە پێش کامیانە؟ ئەم ئایەتە دەلالەتی لەسەر ناکات، ئەدی چۆن بزانین کە ئایا:

ئاسمان‌و زەوی کامیان پێش یان پاش کامیان دروست بوون؟ ئەگەر تەماشای قورئان بکەین بۆمان دەردەکەوێ کە هەردووکیان پێکەوە دروست بوون، وە نوێترین بیردۆزەش دەربارەی دروستبوونی بوونەوەر هەروا دەڵێ، خوای پەروەردگار لە سوورەتی (الأنبياء) لە ئایەتی (٣٠)دا دەفەرموێ: ﴿أَوَلَمْ يَرَ

ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ أَنَّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ كَانَتَا رَتۡقٗا فَفَتَقۡنَٰهُمَاۖ وَجَعَلۡنَا مِنَ ٱلۡمَآءِ كُلَّ شَيۡءٍ حَيٍّۚ أَفَلَا يُؤۡمِنُونَ ﴾، واتە: ئایا ئەوانەی بێ بڕوان نابینن، ئاسمانەکانو زەوی پێکەوە چەسپاو بوون، لێکمان جیاکردنەوە، وە هەموو زیندەوەرێکمان لە ئاو دروستکرد، ئایا هەر ئیمان ناهێنن؟! کەواتە: هەردووکیان پێکەوەو وێکڕا دروست کراون، وە لە سووڕەتی (فصلت)دا دەفەرموێ: ﴿ ثُمَّ ٱسۡتَوَىٰٓ إِلَى ٱلسَّمَآءِ وَهِيَ دُخَانٞ فَقَالَ لَهَا وَلِلۡأَرۡضِ ٱئۡتِيَا طَوۡعًا أَوۡ كَرۡهٗا قَالَتَآ أَتَيۡنَا طَآئِعِينَ ﴾، واتە: دوایی ویستی ئاسمان دروست بکات، کە ئەو کاتە دووکەڵ بوو، ئنجا بە ئاسمانو زەوی فەرمووو: دروست بن بە خۆشیی یان بە ناخۆشیی، گوتیان: ئەوە بە گوێڕایەڵیی‌و بە خۆشیی بە قسەت دەکەین‌و دروست دەبین، کەواتە: هەردووکیان پێکەوە دروست بوون.

**مەسەلەی حەوتەم:** لێرەدا پێویستە ئەوەش ڕوونبکەینەوە، کە خوا ﷻ لە قورئاندا دەفەرموێ: بە شەش ڕۆژان ئاسمانەکانو زەوی دروست بوون، ئەو شەش ڕۆژەش کە مەبەست پێیان شەش قۆناغو شەش ماوە (مدة)ن لە کات، ئەگەر تەماشای سووڕەتی (فصلت) بکەین دوو قۆناغ بۆ دروستکرانی ئاسمانو زەوین پێکەوەو، چوار (٤) قۆناغیش دروستکرانی پێداویستیەکانی ژیانی ئینسانن لەسەر زەوی، ئایەتەکان ئاوا دەفەرموون: ﴿ قُلۡ أَئِنَّكُمۡ لَتَكۡفُرُونَ بِٱلَّذِي خَلَقَ ٱلۡأَرۡضَ فِي يَوۡمَيۡنِ وَتَجۡعَلُونَ لَهُۥٓ أَندَادٗاۚ ذَٰلِكَ رَبُّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٩﴾ وَجَعَلَ فِيهَا رَوَٰسِيَ مِن فَوۡقِهَا وَبَٰرَكَ فِيهَا وَقَدَّرَ فِيهَآ أَقۡوَٰتَهَا فِيٓ أَرۡبَعَةِ أَيَّامٖ سَوَآءٗ لِّلسَّآئِلِينَ ﴿١٠﴾ ثُمَّ ٱسۡتَوَىٰٓ إِلَى ٱلسَّمَآءِ وَهِيَ دُخَانٞ فَقَالَ لَهَا وَلِلۡأَرۡضِ ٱئۡتِيَا طَوۡعًا أَوۡ كَرۡهٗا قَالَتَآ أَتَيۡنَا طَآئِعِينَ ﴿١١﴾ فَقَضَىٰهُنَّ سَبۡعَ سَمَٰوَاتٖ فِي يَوۡمَيۡنِ وَأَوۡحَىٰ فِي كُلِّ سَمَآءٍ أَمۡرَهَاۚ وَزَيَّنَّا ٱلسَّمَآءَ ٱلدُّنۡيَا بِمَصَٰبِيحَ وَحِفۡظٗاۚ ذَٰلِكَ تَقۡدِيرُ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡعَلِيمِ ﴿١٢﴾ ﴾ فصلت، واتە: {ئایا ئێوە بێبڕوان بە کەسێك کە زەوی لە دوو ڕۆژاندا دروستکردوەو هاوتایانی بۆ دادەنێن؟ ئا ئەوە

پەروەردگاری جیهانەکانە (٩) وە لە ماوەی چوار ڕۆژاندا چیایەکانی لەسەر ڕۆنان و پیت و پێزی تێخستو بژیوو پێداویستیەکانی بە یەکسانیی بۆ داواکەرەکان تێدا دانان (١٠) پاشان ڕووی کردە ئاسمان کە ئەوکاتە دووکەڵ بوو، وە بەویش و بە زەویشی فەرموو: بە خۆشیی یان بە ناخۆشیی پەیدابن! ئەوانیش گوتیان: بەخۆشیی هاتینەدی (١١) ئیدی سەرەنجام بە دوو ڕۆژان حەوت ئاسمانی پێکهێنان و فەرمانی خۆیشی لە هەموو ئاسمانێکدا ڕاگەیاند، وە ئاسمانی نیزیکمان بە چرا یان ڕازاندنەوەو بۆ پارێزگارییش (لە ڕاگەیاندنی وەحی) ئەو ئەستێرانەمان دانان، چونکە لەکاتی گوێگرتنی شەیتانەکاندا بە پارچەی ئەستێرەو خڕۆکەکان بەردباران دەکرێن) ئا ئەوە ئەندازەگیریی (خوایەکی) زاڵی زانایە (١٢)} دیارە کەسێك هەر بە ڕواڵەت تەماشا بکات وادەزانێ ڕۆژەکانی تێدا دروستکرانی ئاسمانەکان و زەوی، هەشتن: بەدوو ڕۆژان زەوی دروستکردوە: ﴿ خَلَقَ ٱلْأَرْضَ فِى يَوْمَيْنِ ﴾، وە بە چوار ڕۆژی دیکە پێداویستیەکانی زەوی دروستکردوەو، دوایی بە دوو ڕۆژی دیکەش ئاسمانی دروستکردوەو، سەرەنجام دەبنە هەشت! بەڵام لەڕاستییدا وانیەو خوا ﷻ کە باسی دروستکرانی زەوی دەکات، دەیخاتە نێو دروستکرانی ئاسمانەوە، چونکە زەوی بۆخۆی خڕۆکەیەکە لە کۆمەڵەی خۆرو، کۆمەڵەی خۆریش بۆخۆی بەشێکە لە ئاسمان، کە هەمووی بە دوو قۆناغ (ڕۆژ) دروست بووە، قۆناغی پێکەوە چەسپاوبوون و لێك جیاکرانەوە (الرتق والفتق)، بەڵام زەوی بە چوار قۆناغان وا هەڵخراوە، کە شاخەکانی تێدا دروست بن و، ئاوی تیا دروست بێت و، لەوەڕگای تێدا دروست بێت و، بەکەڵکی ئەوە بێ کە ژیانی لەسەر دروست بێت، چونکە دەفەرموێ: ﴿ وَجَعَلَ فِيهَا رَوَٰسِىَ مِن فَوْقِهَا وَبَٰرَكَ فِيهَا وَقَدَّرَ فِيهَآ أَقْوَٰتَهَا فِىٓ أَرْبَعَةِ أَيَّامٍ ﴾، کەواتە: لە چوار ڕۆژاندا ئەو کەین و بەینە کراوە لەسەر زەوی، کە بەکەڵکی ئەوە بێت ژیانی ئینسانی تێدا بەڕێوەبچێ.

بە کورتی: ئەو دوو ڕۆژە، کە دەفەرموێ: ﴿ خَلَقَ ٱلْأَرْضَ فِى يَوْمَيْنِ ﴾، لەگەڵ ئەو دوو ڕۆژە، کە دەفەرموێ: ﴿ فَقَضَىٰهُنَّ سَبْعَ سَمَٰوَاتٍ فِى يَوْمَيْنِ ﴾، هەر یەکن و بە دوو ئیعتیبارو موناسەبە دووجار باسکراون، کەواتە: (٢) قۆناغی دروستکرانی ئاسمان و زەوی + (٤) قۆناغی ئامادەکردنی زەوی بۆ ژیان = (٦) قۆناغ.

**مەسەلەی هەشتەم:** دەربارەی حەوت ئاسمانەکانیش کە خوا دەفەرموێ: حەوت ئاسمان، تا ئێستا زانیاری هیچ دەربارەی حەوت ئاسمانەکان نازانێ، بەڵام لە ڕێگەی وەحییەوە بۆمان دەرکەوتوە، کە ئاسمانەکان لەسەریەکن، چین لەسەر چین، وە لە فەرمایشتی پێغەمبەردا ﷺ کە بوخاریی و موسلیم و (أصحاب السُنَن) دەیگێڕنەوە بەتایبەتی کە باسی میعراج دەکات، باسی ئەوە دەکات چۆن پێغەمبەر ﷺ دەچێتە ئاسمانی یەکەم و دووەم و... هەتا حەوتەم، وە لە هەر کام لەو حەوت ئاسمانانە کەسانێك لە پێغەمبەران هەبوون کەواتە: ئاسمانەکان دەروازەو دەرگایان هەیە، بەڵام تا ئێستا زانیاری گەردووناسیی هیچی لەوبارەوە بۆ ڕوون نەبۆتەوە، ئەوەندە هەیە بەپێی ئەم ئایەتە کە لە چەند شوێنێکی دیکەشدا هاتوە: ﴿ وَلَقَدْ زَيَّنَّا ٱلسَّمَآءَ ٱلدُّنْيَا بِمَصَٰبِيحَ وَجَعَلْنَٰهَا رُجُومًا لِّلشَّيَٰطِينِ ﴿٥﴾ ﴾ الملك، واتە: ئاسمانی نزیك ئێوەمان بە چراکان ڕازاندۆتەوە، وە کردووشمانە (واتە: ئەو پارچانەی لێیان جیادەنەوە) بە بەردی پێ بەرد بارانکرانی شەیتانەکان، کە دیارە مەبەست پێی ئەستێرەکانە، کەواتە: هەرچی ئەستێرەیەو دەبینرێ لە هەموو کەهکەشانەکاندا، هەمووی دەکەوێتە قەڵەمڕەوو بازنەی ئاسمانی یەکەمەوە، ئنجا نازانین ئەویش لە کوێوە کۆتایی پێ دێت، پاشان لە سەرووی ئەو ئاسمانەوەش، شەش ئاسمانی دیکە هەن.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ..

# دەرسی هەشتەم

## پێناسـەی ئەم دەرسـە

ئەم دەرسەمان بریتیە لە تەفسیری دە ئایەت، ئایەتی ژمارە (٣٠ هەتا ٣٩) لەم دە ئایەتەدا وەك كاتی خۆی لە سەرەتای پێناسەی سوورەتی (البقرة)ش دا، باسم كرد، خوا ﷻ باسی بەسەرهاتی (ئادەم)مان بۆ دەكات، باپیرە گەورەمان ئادەم ﷺ، كە چۆن خوا ﷻ كردوویەتی بەجێنشینی خۆی لەسەر زەوی، وە چۆن فریشتەكانی ئاگادار كردۆتەوەو ئەوانیش پرسیاریان كردوە دەربارەی حیكمەتی دیاریكردنی ئادەم بۆ جێنشینایەتی؟ وە دوایی خوای كاربەجێ ئەو حیكمەتەی بۆ دەرخستوون، بەوە كە ئادەم ناوی شتەكانی زانیوە، وە فریشتەكان نەیانزانیوە، وە دوایی خوای زاناو شارەزا فەرمانی كردوە بە هەموو فریشتەكان كە كڕنووش بۆ ئادەم بەرن، كڕنووشی ڕێزگرتن، پاشان بە ئادەمی فەرمووە، هەروەها بە هاوسەرەكەیشی كە (حەووا)یە (سەلامی خوایان لێبێ)، كە لە بەهەشتدا نیشتەجێ ببن‌و بە ئارەزووی خۆیان هەر شتێكی حەزیان لێیە لە بەهەشتدا بخۆن‌و سوودی لێ ببینن، بەڵام خۆیان لە درەختێك بپارێزن، وە دوایی شەیتان خوتخوتەی بۆ كردوون‌و فریوی داون، كە لەو درەختە قەدەغەكراوە بخۆن، وە سەرەنجام شایستەی ئەوە بوون، كە خوا ﷻ لە بەهەشتدا دەریانكات وە بیانهێنێتە سەر زەوی‌و، لەسەر زەوی نیشتە جێیان بكات، ئنجا دوای ئەوەی ئادەم‌و حەووا سەلامی خوایان لێبێ، چەند وشەیەك لە پەروەردگاریانەوە وەردەگرن‌و تەعبیریان پێ لە پەشێمانیی‌و گەڕانەوەی خۆیان دەكەن‌و، خوا لێیان خۆشدەبێ، وە ئاگاداریشیان دەكاتەوە كە هەركات لە خواوە ڕێنمایی یان بە پێغەمبەراندا بۆ هات (واتە: بۆ وەچەی ئادەم‌و حەووا) وە شوێن ڕێنمایی خوا كەوتن، ئەوە سەرفراز دەبن‌و

ترس‌و پەژارە ڕوویان تێناکات، بەڵام ئەگەر بێت‌و بێبڕوایی بە درۆ دانان بکەنە پیشە، ئەوە مسوّگەر، گیرۆدەی دۆزەخ دەبن‌و دەبنە هاوەڵ‌و خاوەنی.



﴿وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَٰٓئِكَةِ إِنِّى جَاعِلٌ فِى ٱلْأَرْضِ خَلِيفَةً ۖ قَالُوٓا۟ أَتَجْعَلُ فِيهَا مَن يُفْسِدُ فِيهَا وَيَسْفِكُ ٱلدِّمَآءَ وَنَحْنُ نُسَبِّحُ بِحَمْدِكَ وَنُقَدِّسُ لَكَ ۖ قَالَ إِنِّىٓ أَعْلَمُ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴿٣٠﴾ وَعَلَّمَ ءَادَمَ ٱلْأَسْمَآءَ كُلَّهَا ثُمَّ عَرَضَهُمْ عَلَى ٱلْمَلَٰٓئِكَةِ فَقَالَ أَنۢبِـُٔونِى بِأَسْمَآءِ هَٰٓؤُلَآءِ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٣١﴾ قَالُوا۟ سُبْحَٰنَكَ لَا عِلْمَ لَنَآ إِلَّا مَا عَلَّمْتَنَآ ۖ إِنَّكَ أَنتَ ٱلْعَلِيمُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٣٢﴾ قَالَ يَٰٓـَٔادَمُ أَنۢبِئْهُم بِأَسْمَآئِهِمْ ۖ فَلَمَّآ أَنۢبَأَهُم بِأَسْمَآئِهِمْ قَالَ أَلَمْ أَقُل لَّكُمْ إِنِّىٓ أَعْلَمُ غَيْبَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَأَعْلَمُ مَا تُبْدُونَ وَمَا كُنتُمْ تَكْتُمُونَ ﴿٣٣﴾ وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلَٰٓئِكَةِ ٱسْجُدُوا۟ لِءَادَمَ فَسَجَدُوٓا۟ إِلَّآ إِبْلِيسَ أَبَىٰ وَٱسْتَكْبَرَ وَكَانَ مِنَ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٣٤﴾ وَقُلْنَا يَٰٓـَٔادَمُ ٱسْكُنْ أَنتَ وَزَوْجُكَ ٱلْجَنَّةَ وَكُلَا مِنْهَا رَغَدًا حَيْثُ شِئْتُمَا وَلَا تَقْرَبَا هَٰذِهِ ٱلشَّجَرَةَ فَتَكُونَا مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٣٥﴾ فَأَزَلَّهُمَا ٱلشَّيْطَٰنُ عَنْهَا فَأَخْرَجَهُمَا مِمَّا كَانَا فِيهِ ۖ وَقُلْنَا ٱهْبِطُوا۟ بَعْضُكُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ ۖ وَلَكُمْ فِى ٱلْأَرْضِ مُسْتَقَرٌّ وَمَتَٰعٌ إِلَىٰ حِينٍ ﴿٣٦﴾ فَتَلَقَّىٰٓ ءَادَمُ مِن رَّبِّهِۦ كَلِمَٰتٍ فَتَابَ عَلَيْهِ ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٣٧﴾ قُلْنَا ٱهْبِطُوا۟ مِنْهَا جَمِيعًا ۖ فَإِمَّا يَأْتِيَنَّكُم مِّنِّى هُدًى فَمَن تَبِعَ هُدَاىَ فَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿٣٨﴾ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَكَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَآ أُو۟لَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِ ۖ هُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿٣٩﴾﴾

## ماناى وشە بە وشەى ئایەتەکان

((وە یادبکەوە کاتێك پەروەردگارت بە فریشتەکانی فەرمووو: من جێنشینێك لەسەر زەوی دادەنێم، گوتیان: جا چۆن کەسێکی تێدا دادەنێی، کە خراپەکاریی تێدا دەکات‌و خوێنی تێدا دەڕێژێ (وە ئێمە دانانێی) لە حاڵێکدا، کە ئێمە هەردەم

سەرگەرمی بە دوورگرتنت لە هەڵەو پەڵەو ستایشکردنو بە پاك گرتنتین؟ فەرمووی: ئەوەی من دەیزانم ئێوە نایزانن (٣٠) وە خوا ئادەمی فێری ناوی سەرجەم شتەکان کردو، دوایی شتەکانی لەسەر فریشتەکان ڕانواندنو فەرمووی: ئەگەر ڕاست دەکەن (ئێوە شایستەترن بە جێنشینایەتی لەسەر زەوی) ناوی ئەو شتانەم پێ بڵێن (٣١) ئەوانیش گوتیان: بە پاکت دەگرین جگە لەوەی تۆ فێرت کردووین، هیچ زانیارییەکی دیکەمان نیە بێگومان تۆ زانای کاربەجێی (٣٢) (خوا) فەرمووی: ئەی ئادەم ناوی شتەکانیان پێ بڵێ، جا کاتێك ناوەکانیانی پێگوتن، (خوا) فەرمووی: ئەدی من پێم نەگوتن من نهێنی ئاسمانەکانو زەوی دەزانمو، دەزانم چی ئاشکرا دەکەنو چی پەنهان دەکەن! (٣٣) وە یاد بکەوە کاتێك بە فریشتەکانمان فەرموو: کڕنووش بۆ ئادەم ببەن، ئەوانیش یەکسەر کڕنووشیان برد، بێجگە لە ئیبلیس سەرپێچی کردو خۆی بەزل گرت، وە لە کافران بوو (٣٤) وە گوتمان ئەی ئادەم خۆتو هاوسەرەکەت لە بە هەشتدا نیشتەجێ بنو، لە هەر شتێكو لە هەر کوێیەك ویستتان بە خۆشییو فراوانیی لێی بخۆن، بەڵام توخنی ئەم درەختە نەکەون، ئەگەرنا لە ستەمکاران دەبن (٣٥) ئنجا شەیتان بە هۆی ئەو درەختەوە، خلیسکاندنیو لەو (نازو نیعمەت)ەی تێیدا بوون وەدەرینان، وە پێمان گوتن: بچنە خوارێ، هەندێکتان دوژمنی هەندێکتانن، وە لە زەوی نشینگەو گوزەرانتان دەبێت هەتا ماوەیەك (٣٦) ئنجا ئادەم چەند وشەیەکی لە پەروەردگاری وەرگرتنو ئەویش لێی خۆشبوو، بێگومان ئەو لێبوردەی بەخشندەیە (٣٧) گوتمان: هەمووتان لێی بچنە دەرێ (و شۆڕبنەوە بۆ زەوی) جا هەر کاتێ لە منەوە ڕێنماییتان بۆ هات، ئەوە هەر کەس شوێن ڕێنمایی من بکەوێ، نەترسی لەسەر دەبێو نە پەژارە دادەگرێ (٣٨) وە ئەوانەی بێ بڕوانو ئایەتەکانمان بەدرۆ دەزانن، ئەوانە هاوەڵی ئاگرن، وە بە هەمیشەیی تێیدا دەمێننەوە (٣٩))

## شیکردنەوەی هەندێك لە وشەکان



(لِلْمَلَٰٓئِكَةِ ): (مَلائِکَـة) کـۆی (مَلَـک)ەو (مَلَـک) یەکێکـە لـە فریـشتەکان، وە هەنـدێکیش گوتوویانـە: (مَلائِکَـة) بـۆ تـاكو کـۆ بەکـاردێ، بـەڵام یەکـەمیان ڕاستتـرە.

(خَلِيفَـةً ): بـە (خَلائِـف) کـۆ دەکرێتـەوە، هـەروەك چـۆن (خلیـف) بـە (خُـلَفاء) کۆدەکرێتـەوەو (خَلِیفَـة)و (خَلیـف) هـەردووکیان بـە مانـای جێنـشین دێـن (الخِلافَـةُ: النِّیَابَـةُ عَـنِ الغَیْـرِ، إمَّـا لِـغَیْبَةِ الـمَنُوبِ عَنـهُ، وإمَّـا لِعَجْـزِه، وإمَّـا لِمَوْتِهِ، وَإمَّا لِشَرَفِ المُسْتَخْلَفِ) وشەی (الخِلافَةُ) بریتیە لە جێنشینایەتی کردنـی غـەیری خـۆت، جێنـشینایەتی کـردنیش یـان لەبـەر ئـەوە دەبێـت ئـەو کەسەی کە جێنـشـینی دانـاوە لـەوێ نیـە، یـان لەبـەر ئەوەیـە کە ناتوانـێ یـان لـەبەر ئەوەیـە کـە دەمـرێ، یـان لەبـەر ڕێزلێگـرتن یـەکێك لـە شـوێنی خـۆی دادەنـێو دەیـەوێ ڕێـزی لێبگـرێ، کـە بەنـسبەت ئادەمـەوە ﷺ خـوا کـە کردوویەتی بەجێنشینی خۆی، بە مانای چوارەمیانە.

(نُسَبِّحُ ): ئەسڵی وشـەی (تَسْبِیح) لـە (سَبْح)ەوە هـاتوە: (السَّبْحُ: المَـرُّ السَّریعُ فـي الـمَاءِ، أو فـي الـهَـوَاءِ) تێپـەڕینی خێـرا لـە ئـاودا یـاخود لـە هـەوادا، وە (تَسْبِیح) واتـە: بـەدوورگرتن، بـەدوورگرتنی خـوا لـە هەرچـی کـەموکووڕیی هەیە، لە هەرچی هەڵەو پەڵە هەیە، وە کە دەگوترێ (بِحَمدِك)، واتە ئێمە تـۆ بەدووردەگرین لە عەیبو کەموکووڕیی‌و لە هەمان کاتیشدا ستایشت دەکەین، پێشتـر باسمان کرد کە (حَمْد) بریتیە لە ستایشکردن، کە ماناکەی لە (مَدْح) تایبەتترە، چونکە (مَدْح) هەم هەڵدەگرێ کەسێك مەدح بکرێ، هەم هەڵدەگرێ کە شتێك مەدح بکرێ، واتە: چ خاوەن ئیرادەو ئیختیار بێت، یاخود بێ ئـیرادەو ئیختیار بێت، بۆ وێنە: خواردن مەدح دەکرێ، جـلو بـەرگ مـەدح دەکـرێ... هتد، بەڵام (حَمْد) تەنیا تایبەتە بە کەسێکەوە، کە خاوەنی ئیـرادەو ئیختیـار بێ، وە لەبەر چاکەکان (فضائل)ی تۆ باسی بکەی‌و مەدحی بکەی.

(وَنُقَدِّسُ لَكَ ): (نُطَهِّرُكَ) واتە: تۆ بە پاك دەگرین.



(ٱلْأَسْمَآءَ ): (جَمْعُ إسم، وأصلُهُ مِن السُّمُوِّ وهُوَ الذي بِهِ رَفعُ ذِكْرُ المُسَمَّى فَيُعرَفُ) واتە: (الأسمَآء) كۆی (إسم)ە، واتە: ناو، ئەسڵەكەی لە (السمُو)ەوە هاتوە، (سمو) واتە: بەرزیی، وە ناو ئەوەیە كە لە هەر شتێك دەنرێ، ئەو شتە پێی بەرز دەكرێتەوەو پێی دەناسرێ.

(عَرَضَهُمْ ): (عَرَضَ) واتە: ڕاینواند، پێشانیدا (عَرْضُ شَيءٍ لِلبَيعِ) شتێك بۆ فرۆشتن كە ڕادەنوێنرێ پێی دەگوترێ (عَرْض) هەر لە زانیاری ئابوورییدا یاسای: ڕانواندنو خواستن (عَرْض وطَلَب) هەیە، شتێك دێتە بازاڕ خەڵك داخوازیی دەكات كاتێ (عَرض) دەكرێت.

(أَنۢبِـُٔهُم ): (النَبَأُ: خَبَر ذو فائِدَة عَظِيمَة يَحصَلُ بِهِ علمٌ أو غَلَبَةُ الظَّن)، واتە: (النَبَأُ) بریتیە لە هەواڵێك كە سوودێكی گەورەی هەبێت، وە ببێتە هۆی ئەوەی كە ئینسان بگەیەنێتە زانیاری یاخود گومانێكی زاڵ.

(تُبْدُونَ ): دەریدەخەن، (بَدَا الشَّيءِ يبدو بدوّاً وبِدَاءاً: أَي ظَهَرَ ظهُوراً بَيِّناً)، واتە: شتەكە دەركەوت، دەردەكەوێ، دەركەوتن، یانی: بە ئاشكراكردنێكی ڕوون، دەركەوت .

(تَكْتُمُونَ ): دەڵێ: (كَتْمُ الشَّيءَ يَعني: سَترهُ) واتە: شتەكەی شاردەوە.

(أَبَىٰ ): (الإباء شِدّةُ الإمتِنَاع، فَكُلُّ إباءٍ امتناعٌ ولَيسَ كُلُّ امتِنَاعٍ إبَاءًا)، (أبی) بریتیە لەوەی ئینسان شتێك نەكات زۆر بەسەختییش نەیكا، واتە: زۆر سەختگیریی بكات لە نەكردنیدا.

(وَٱسْتَكْبَرَ ): وشەكانی (الكِبْر والإستِكبَار وَالتَكَبُّر) هەموویان لەمانادا لێك نزیكن، وە (كِبْر) ئاوا پێناسە كراوە (فالكِبرُ الحالَةِ التي يتخَصَّصُ بها الإنسانُ مِن إعجَابِهِ بنفسِهِ، وَذَلِكَ أنْ يرى نفسَهُ أكبَر مِن غَيرِهِ)، حاڵەتێكە

تایبەتە بە ئینسانەوە، كە سەرسامە بە خۆی، ئەویش ئەوەیە كە خۆی پێ لە غەیری خۆی گەورەترە.



(ٱسْكُنْ ): واتە نیشتەجێبە (السُّكونُ: ثبُوتُ الشَّيءِ بَعدَ تَحرُّكٍ)، (سُكون) بریتیە لە سەقامگیربوونی شتێكو ئارامگرتنی دوای ئەوەی كە جووڵاوە. (وَيُستَعْمَلُ في الإستِيطانِ وَاسمُ المكَانِ: مَسكن وجَمعُهُ مَساكن)، واتە: (ٱسْكُنْ) لە نیشتەجێبوونیشدا بەكاردەهێنرێ، وە ناوی شوێنیش بریتیە لە (مسكن) كە بە (مساكن) كۆدەكرێتەوە.

(رَغَدًا ): دەڵێ (عَيْشٌ رَغَدٌ ورَغِدٌ، طَيِّبٌ وَاسِعٌ) دەگوترێ: (عَيْشٌ رَغَدٌ) یان (رَغِدٌ)، واتە: ژیانێكی خۆشو فراوان، واتە فراوان لە ڕووی نازو نیعمەتەوە، پێچەوانەی ژیانی تەنگو ترووسك، كە ئینسان نەزانێ چی بخواو پەنا بۆچی بەرێ لە ئاتاجیی‌و نەدارییدا.

(فَأَزَلَّهُمَا ): وە خوێندراویشەتەوە: (أَزالَهُمَا). (أزالَهُمَا) یانی: (أزاحَهُمَا) لایدان، وە (أزلَّهُمَا) واتە: خلیسكاندنی، (الزلَّةُ في الأَصْل: إسترسالُ الرِّجل مِنْ غَير قَصْدٍ، يُقالُ زَلّتْ رِجلُهُ تَزِلُّ وَ المَزِلّة المكَان الزَّلِق)، (الزلَّةُ) لە ئەسڵدا ئەوەیە كە ئینسانی پێ بخلیسكێ بەبێئەوەی مەبەستی بێو بیەوێت، وە دەگوترێ (زلَّتْ رِجلُهُ تَزِلُّ)، واتە: پێی خلیسكا، وە (المَزِلّة) شوێنی خلیسكە، كە ئینسان لێی بخلیسكێ.

(ٱهْبِطُواْ ): (الهُبُوطُ الإنحِدَارُ عَلَى سَبِيلِ القَهْرِ كَهُبُوطِ الحجَرِ)، واتە: مانای (هُبُوط) بریتیە لە شۆڕبوونەوە بە شێوەیەك، كە ئینسان بەدەست خۆی نەبێت، یاخود بەزۆر، وەك بڵێی شۆڕی بكەنەوەو خلۆری بكەنەوە، وەك چۆن بەردێك خلۆر دەبێتەوەو بەدەست خۆی نیە.

(مُسْتَقَرٌّ ): (قرَّ في مَكَانهِ يَقِرُّ قَرَارَاً: إذَا ثَبتَ ثُبُوتَاً جَامِدَاً، وأصلُهُ مِنَ القُرِّ وهُوَ البَرْدُ وهُوَ يَقتَضي السُّكُون، كما أنَّ الحرَّ يَقتَضي الحَرَكَة)، واتە: لەجێی

خۆی نیشتەجێ بوو، نیشتەجێ دەبێ، نیشتەجێبوون، کاتێك شتێك دەچەسپێو ناجوولێ، وەلەبنەڕەتدا لە(قُرّ)ەوە هاتوە کە بە مانای (سەرما)یە، چونکەسەرما وەستان دەخوازێ، وەك چۆن گەرما جوولان دەخوازێ.



(وَمَتَٰعٌ): (المَتاعُ: انْتِفَاعٌ مُمْتَدٌّ الوَقْتِ)، (المَتاعُ) ئەوەیە کە ئینسان بە شتێك ڕابوێرێو گوزەرانی پێ بکات، واتە: لێی بەهرەمەندبێ، وە دەگوترێ: (مَتَّعَهُ اللّٰه بِكَذا وَأمْتَعَهُ) واتە: خوا بەو شتە گوزەرانی بسووڕێنێو لێی بەهرەمەندبێ.

(فَتَلَقَّىٰٓ): (تَلَقّاهُ) واتە: (لَقِيَهُ) یانی: وەریگرت، یاخود پێی گەیشت.

(ٱلتَّوَّابُ): (التوبُ: تَركُ الذَّنبِ عَلَى أجمَلِ الوُجُوه)، واتە: وازهێنان لە گوناح بە شێوەیەکی هەرە جوان، (تَوّاب) (صیغة المُبالغة)یە، جا دەگونجێ بەندەش (تَوّاب) بێت، واتە زۆر بگەڕێتەوە بۆ لای خوا، وە خواش (تَوّاب)ە، واتە زۆر دەگەڕێتەوە بۆ لای بەندەکەی، چونکە هەتا بەندە زیاتر بگەڕێتەوە بۆ لای خوای پەروەردگار بە طاعەتو واز لە گوناح بهێنێ، خواش زیاتر دەگەڕێتەوە بۆ لای بەندەکەی بە لێخۆشبوونو لێبوردنیو گەڕانەوەکەی لێ قەبوولێ دەکات.

(وَكَذَّبُواْ): (كَذَبَ) واتە: درۆی کرد، بەلاّم (كَذَّبَ)، واتە: بەرانبەرەکەی خۆی بەدرۆ زانی، دەڵێ: (كَذَّبْتَهُ: نَسَبْتُهُ إلى الكَذِبِ، صَادِقاً كَانَ أو كَاذِباً) (كَذَّبْتُهُ)، واتە: بەرانبەرەکەی خۆمم بە درۆ زانی، جا ڕاست بکا یاخود درۆ بکا، هەرکاتێ بەرانبەری خۆتت بەدرۆ زانی، مانای وایە ئەوە (تکذیب)ت کردوە.

(أَصۡحَٰبُ): (الصَاحِب: الملازم إنسَاناً كَانَ أو حَيواناً أو مَكَاناً أو زَمَاناً)، واتە: (صَاحِبْ) هەر شتێکە بەردەوام لەگەڵت دابێ، جا ئینسان بێ، یان ئاژەڵ، یان شوێن، یان کات، (ويُقَالُ للمالك للشَّيء: هُوَ صَاحِبَهُ)، واتە: وە بە خاوەنی شتیش دەگوترێ: (صَاحِب)، چونکە ئەویش هەمیشە لەگەڵ شتی خۆیەتیو، کەسێك خاوەنی شتێك بێت هەمیشە شتەکە لەژێر کۆنتڕۆڵی دایە.

(خَٰلِدُونَ): (الخلُودُ: هو تبَرِّي الشَيءِ مِن اعتراض الفَسَادِ، وَبقَاؤُهُ علَى الحَالَةِ التي هو علَيهَا)، واتە: (الخلود) بریتییە لەوەی کە شتێك حاڵەتی تێکچوونی بەسەردا نەیەتو، لەسەر حاڵەتی خۆی کە لەسەری بووە بمێنێتەوە. (خَلَدْ: اسم للجُزءِ الذي يَبقَى مِنَ الإنسان عَلَى حَالَتِهِ فلاَ يَستحِيلُ مَادَامَ الإنسَان حَيّاً استحالة سَائِر أجزائِهِ) واتە: (خَلَدْ) بەو بەشە دەگوترێ، کە لە مرۆڤدا وەك خۆی دەمێنێتەوە هەتا مرۆڤ زیندووبێو وەك ئەندامەکانی دیکەی ناگۆڕێ، کە دیارە مەبەست پێی مێشکە، دەگوترێ: (جَرى هَذَا فِي خَلَدِهِ) یانی: ئەوەی بە مێشك داهات، ئەویش لەبەرئەوەی دەماغ لەکاتێکدا، کە خانەکانی هەموو بەدەن دەگۆڕێنو نوێ دەبنەوە، خانەکانی ئەو ناگۆڕێن، وە چەندن هەر ئەوەندەن کەمو زیاد ناکەن، کەواتە: (خلود) واتە: مانەوە، مانەوەیەکی بێ کۆتایی، یاخود هەر مانەوە، کۆتایی هەبێ یان نا.

## مانای گشتی ئایەتەکان

لەم ئایەتانەدا سەرەتا خوا ﷻ باسی بەسەرهاتی (ئادەم)مان بۆ دەکات، وە پاشان باسی خۆیو هاوسەرەکەیشی (حەووا) سەلامی خوایان لێبێت دەکات، دوای ئەوەی لە (٢٠) ئایەتی یەکەمدا خوا باسی پێکهاتەکانی کۆمەڵگای ئیسلامیی کرد، وە لە نۆ (٩) ئایەتی دواییدا، واتە لە ئایەتی (٢١ تا ٢٩)، بانگی مرۆڤایەتی کرد کە بیپەرستن، وە بانگی کردن کە ئیمان بە پێغەمبەرەکەی بێنن ﷺ، وە ئیمان بەو قورئانە بێنن کە بۆی ناردوە، پاشان باسی بەهەشتی کرد، وە باسی وێنە هێنانەوەی کرد، وە هەڵوێستی ئەهلی ئیمانی لەبەردەم وێنە هێنانەوەی خواداو هەڵوێستی ئەهلی کوفری خستەڕوو، پاشان ڕووی لە ئەهلی کوفر کرد کە: بە چ پاساوێك کوفر هەڵدەبژێرن بەسەر ئیماندا؟! ئنجا باسی کرد کە چۆن ئاسمانەکانو زەویو هەرچی لە زەویدا هەیە بۆ مرۆڤەکانی دروستکردوە، ئنجا دیارە دوای ئەوەی کە خوای پەروەردگار ئاسمانەکانی دروستکردوون، زەوی ئامادە کردوە، ئەمجار (ئادەم) و (حەووا)ی بابو دایکمانی لەسەر داناوە (علیهما السلام)، دوای

ئەوە دەفەرموێ: کە دیارە دواندن (خِطاب)ەکە لەگەڵ پێغەمبەری خاتەمە ﷺ، بەڵام هەموو دواندنەکانی خوا لەگەڵ پێغەمبەری کۆتایی ﷺ، لەگەڵ ئۆممەتەکەشیەتی، مەگەر دواندنێك بە بەڵگەیەك تایبەت کرابێ بە پێغەمبەرەوە ﷺ، ئەگەرنا هەرچی لەگەڵ موحەممەدیەتی ﷺ لەگەڵ ئۆممەتەکەشیەتی، دەفەرموێ: ﴿ وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَٰٓئِكَةِ إِنِّي جَاعِلٌ فِي ٱلْأَرْضِ خَلِيفَةً ﴾، واتە: یاد بکەوە کاتێك پەروەردگارت بە فریشتەکانی فەرموو: من جێنشینێك لەسەر زەوی دادەنێم، هەڵبەتە لێرەدا خوا کە بە فریشتەکانی فەرمووە، یانی: ئاگاداری کردوونەتەوە، نەك پرسی پێکردبن! هەندێك لە توێژەرەوانی قورئان کە بەشێوەیەکی سادەو سەرکێڵ تەماشای ئەم تەعبیرەیان کردوە، گوتوویانە: خوا ڕاوێژی پێ کردوون! بەڵام خوا لەوە بەرزترە ڕاوێژ بە غەیری خۆی بکات، بەڵکو مەسەلە هەر ئەوەیە کە ئاگاداری کردوونەتەوەو حیکمەتیش ئەوە بووە، کە ئەوانیش قسە دەکەن‌و، خوای پەروەردگاریش وەڵامیان دەداتەوەو لە ئەنجامدا حیکمەتی ئەوە کە خوا ئادەمی کردوە بە جێنشینی خۆی لەسەر زەوی، لە ئەنجامی ئەم وتووێژەی لە نێوان خوای بەرزو بێ وێنەو فریشتەکانیدا، حیکمەتەکە دەردەکەوێ، جا دیارە وەك (ئیستیفسار)و بۆ ڕوون بوونەوە فریشتەکان دەڵێن: ﴿ أَتَجْعَلُ فِيهَا مَن يُفْسِدُ فِيهَا وَيَسْفِكُ ٱلدِّمَآءَ ﴾، واتە: چۆن کەسانێك لەسەر زەوی دادەنێی کە ئاشووبی تێدا دەگێڕن‌و خراپەی تێدادەکەن‌و خوێنی تێدا دەڕێژین؟! جا ئایا فریشتەکان چۆنیان زانیوە کە ئادەم‌و وەچەی ئادەم خراپە لە زەویدا دەکەن‌و ئاشووبی تێدا دەگێڕن، وە خوێنی تێدا دەڕێژن؟ توێژەرەوانی قورئان زۆر شتیان باسکردوە، بەڵام مانای دەقی ئایەتەکە کافیەو پێویست ناکات بەملاو بەولادا بڕۆین، کاتێ خوا بە فریشتەکانی فەرمووە جێنشینێك لەسەر زەوی دادەنێم، دیارە تێشیگەیاندوون ئەو جێنشینە کێیە؟ واتە: هاوکات لەگەڵ ئەو هەواڵپێدانەدا، خوا ﷻ سروشتی ئەو جێنشینەشی لێ حاڵی کردوون، وە ئەوانیش لە ناسینی سروشتی ئەو جێنشینەوە، کە ئادەم‌و خێزانەکەی، وە وەچەکەیانە، هەڵیانهێنجاوە، زانیویانە کە بەشەرێك بەو شێوەیە تەرکیب بووبێ، لە نەفخەیەکی خوایی و لە ئەندازە خاکێکی زەوی، وە هەرکام لە پاڵنەری شەڕو خێری تێدابن، حەتمەن وێڕای چاکە

خراپەش دەکاو خوێنیش دەڕێژێ لەسەر زەوی، جا کاتێك ئەوان دەڵێن: چۆن ئینسانێکی وا لەسەر زەوی دەکەیە جێنشین، ئەوکات دەڵێن: ﴿وَنَحْنُ نُسَبِّحُ بِحَمْدِكَ وَنُقَدِّسُ لَكَ﴾، واتە: لە حاڵێکدا کە ئێمە بە ستایش کردنتەوە بە پاکت دەگرین و بێ خەوشییت ڕادەگەیەنین، دیارە لە پەنادا دەڵێن: ئێمە شایستەترین بە بۆچوونی ئێمە لە ئادەم، کە ببینە جێنشینی تۆ لەسەر زەوی، هەڵبەتە لێرەدا مەبەستیان ئەوە نەبووە ڕەخنە لە خوا بگرن!! چونکە فریشتەکان زۆر لەوە پاکترن و، زۆر لەوەش زاناترن، کە ڕێگا بەخۆیان بدەن ڕەخنە لە خوا ﷻ بگرن، بەڵکو مەبەستیان ئەوە بووە کە حیکمەتی ئەوەیان بۆ دەرکەوێ، خواش (تبارك و تعالى) دەفەرموێ: ﴿إِنِّيٓ أَعۡلَمُ مَا لَا تَعۡلَمُونَ﴾، واتە: ئەوەی من دەیزانم ئێوە نایزانن، یانی: دوایی بۆتان دەردەکەوێ، کە بۆچی ئادەم شایستەی ئەوەیە کە جێنشینی من بێ لەسەر زەوی، ئنجا خوای زانا حیکمەتەکەیان بۆ دەردەخات و، لە پێشدا ئادەم فێری هەموو ناوەکان دەکات (ناوی شتەکان)، ﴿وَعَلَّمَ ءَادَمَ ٱلۡأَسۡمَآءَ كُلَّهَا﴾، دوایی ئەو شتانەی کە ناوەکانیانی فێری ئادەم کردوە، پێشانی فریشتەکانیان دەدا ﴿ثُمَّ عَرَضَهُمۡ عَلَى ٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ﴾، واتە: شتەکانی پێشانی فریشتەکاندا نەك ناوەکان، چونکە ناو پێشان نادرێ، وە بەبەڵگەی ئەوەی دوایی دەفەرموێ: ﴿فَقَالَ أَنۢبِـُٔونِي بِأَسۡمَآءِ هَٰٓؤُلَآءِ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ﴾، واتە: فەرمووی: ناوی ئەو شتانەم پێ بڵێن، ئەگەر ڕاست دەکەن ئێوە شایستەترن، مانا وایە شتەکانی پێشان داون، چونکە ئەگەر ناوەکانی پیشاندابان، مانای وایە ناوەکانی فێردەکردن، ئەوانیش دیارە وەڵامدەدەنەوەو دەڵێن: ﴿قَالُواْ سُبۡحَٰنَكَ لَا عِلۡمَ لَنَآ إِلَّا مَا عَلَّمۡتَنَآۖ إِنَّكَ أَنتَ ٱلۡعَلِيمُ ٱلۡحَكِيمُ﴾، گوتیان: پاکیی بۆ تۆ، بێجگە لەوەی کە تۆ فێرت کردووین، ئێمە هیچ زانیاری دیکەمان نیە، بەڕاستی هەر تۆ زانای کاربەجێی، زانیاری فریشتەکان زانیارییەکی بەخشراو (وهب)یە، زانیارییەکی وەدەستهێنراو (کسبي) نیە، واتە: وەك فریشتە ئینسان نیە، ئینسان خوا توانایەکی داوەتێ بۆ خۆی زانیاری وەدەست

بێنێ، بەڵام زانیاری فریشتەکان، زانیارییەکە نە کەمدەکات وە نەزیاد دەکاتو زانیارییەك لەلایەن خواوە بەخشراوە خوا چەندی دابنێ هەر ئەوەندەیە، وە خوا ﷻ زانیاری ئەوەی نەداوەتە فریشتەکان کە ناوی شتەکانی سەر زەوی بزانن، بۆچی؟ چونکە لەسەر زەوی ناژینو پێویستییان بەو زانیارییە نیە، خوای کاربەجێ جۆرە زانیارییەکی فێری فریشتەکان کردوە، کە پێویستییان پێی هەیە، ئنجا خوا بە ئادەم دەفەرموێ: ﴿ قَالَ يَـٰٓـَٔادَمُ أَنۢبِئۡهُم بِأَسۡمَآئِهِمۡۖ فَلَمَّآ أَنۢبَأَهُم بِأَسۡمَآئِهِمۡ ﴾، واتە: فەرمووی ئەی ئادەم ناوی ئەو شتانەیان پێ بڵێ، ئنجا کاتێك هەواڵی ناوەکانیانی پێدان، واتە ئادەم لێرەدا دەبێتە مامۆستاو فێرکەری فریشتەکان، وە فریشتەکان دەبن بە قوتابی لەم مەسەلەیەدا، ئنجا خوا ﷻ پێیان دەفەرموێ: ﴿ قَالَ أَلَمۡ أَقُل لَّكُمۡ إِنِّيٓ أَعۡلَمُ غَيۡبَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَأَعۡلَمُ مَا تُبۡدُونَ وَمَا كُنتُمۡ تَكۡتُمُونَ ﴾، واتە: (خوا) فەرمووی: من پێم نەگوتن کە نهێنی ئاسمانەکانو زەوی دەزانمو، دەزانم ئەوەی دەریدەخەنو ئەوەی دەیشارنەوە (کە بریتیە لەوە کە باسی خۆتان دەکەن، کە ئێوە هەمیشە سەرگەرمی بەدوورگرتنی خوان لە کەموکووڕییو ستایشکردنو بە پاکگرتنی لە عەیبو کەموکوڕیی بۆیە شایستەیی جێنشینێتی خواتان هەیە، وە ئەوەی کە ئاشکرایان کردوە، ئەوە بووە کە باسی ئادەمیان کردوە کە خراپە دەکات لە زەویداو خوێن دەڕێژێ) دیارە خوای پەروەردگاریش نەیفەرمووە ئادەم ئەوە ناکات، بەڵام خوای دادگەر سەرنجی فریشتەکانی بۆ ئەوە ڕاکێشاوە، کە ئەگەر ئادەم و وەچەی ئادەم خراپەیان لەدەست دێت، چاکەشیان لە دەست دێت، وە ئەگەر کەموکووڕییان هەیە، کە بریتیە لە هاندەری شەڕو خراپە، ئەوە فەزیڵەتو ئیمتیازێکیشیان هەیە کە لە ئێوەدا نیە! بەڵام هەڵبەتە فریشتەکان زانیویانە کە حیکمەتێکی تێدایە کە ئەوان لەگەڵ ئەوەشدا کە هەمیشە سەرگەرمی خواپەرستییو بەندایەتییو تەسبیحو تەقدیسی خوان، بەڵام خوا نایانکاتە جێنشین! ئیدی سەرەنجام خوا حیکمەتەکەی بۆ دەرخستن.

پاشان خوا ﷻ دوای ئەوە بە فریشتەکان دەفەرموێ: ﴿ وَإِذۡ قُلۡنَا لِلۡمَلَـٰٓئِكَةِ ٱسۡجُدُواْ لِأٓدَمَ فَسَجَدُوٓاْ إِلَّآ إِبۡلِيسَ أَبَىٰ وَٱسۡتَكۡبَرَ وَكَانَ مِنَ ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴾، واتە: وە یاد

بکەوە کاتێك بە فریشتەکانمان گوت: هەمووتان کڕنووش بەرن بۆ ئادەم، هەموویان کڕنووشیان برد جگە لە ئیبلیس سەرپێچی کردو خۆی بەزلگرت و لە کافران بوو، بە تەئکید لێرەدا مەبەست لە کڕنووش کڕنووشی ڕێزگرتنە نەك کڕنووشی عیبادەت، کە تەنیا بۆ خوا دەبردرێ، دیارە لێرەدا فەرمان بە فریشتەکان کراوەو ئیبلیسیش فریشتە نیە، بەڵام لەبەرئەوەی لەنێو فریشتەکاندا بووە بۆیە ئەویشی گرتۆتەوە، ئەگەرنا ئیبلیس لە (جن)ە، وەك خوا فەرموویەتی: ﴿ وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلَٰٓئِكَةِ ٱسْجُدُوا۟ لِءَادَمَ فَسَجَدُوٓا۟ إِلَّآ إِبْلِيسَ كَانَ مِنَ ٱلْجِنِّ فَفَسَقَ عَنْ أَمْرِ رَبِّهِۦٓ ...﴿٥٠﴾ ﴾ الكهف، واتە: وە کاتێك بە فریشتەکانمان گوت کڕنووش بۆ ئادەم بەرن‌و کڕنووشیان برد، جگە لە ئیبلیس کە لە (جن) بوو، جا لە فەرمانی پەروەردگاری لایدا. لێرەدا خوا بە ڕاشکاویی دەفەرموێ ئیبلیس لە جندانە، وە پاشان ئیبلیس سەرپێچیی لە فەرمانی خوا کرد، لە حاڵێکدا کە خوا لەبارەی فریشتەکانەوە دەفەرموێ: ﴿ لَّا يَعْصُونَ ٱللَّهَ مَآ أَمَرَهُمْ وَيَفْعَلُونَ مَا يُؤْمَرُونَ ﴿٦﴾ ﴾ التحريم، واتە: سەرپێچیی لە فەرمانی خوا ناکەن و هەر فەرمانێکیان پێبکرێ یەکسەر جێبەجێی دەکەن، کەواتە: ئەم دوو بەڵگەیە بەسن بۆ ئەوەی ئیسپات بێت کە ئیبلیس لە (جنّ)ەو فریشتە نیە، بەڵام هەندێك لە توێژەرانی قورئان دەڵێن: نەخێر ئیبلیس هەر لە فریشتەکان بووەو کە دەفەرموێ: ﴿ ...كَانَ مِنَ ٱلْجِنِّ ...﴿٥٠﴾ ﴾ الكهف، واتە: خۆی شاردۆتەوەو خۆی پەنهان کردوە !! بەڵام لەڕاستیدا ڕایەکەیان بێهێزە، چونکە خوا ﷻ فریشتەکانی وا خوڵقاندوە کە سەرپێچیی لێ ناکەن، وە نەمانبیستوە هیچ فریشتەیەك سەرپێچیی لە فەرمانی خوا کردبێ‌و ، (هاڕووت و ماڕووت)یش کە خوا دایبەزاندوون بۆ (بابل)و جادوویان فێری خەڵك کردوە، ئەوە بە فەرمانی خوا بووە، واتە: کە جادووشیان فێری خەڵك کردوە، خوا پێی فەرموون کە جادوو فێری خەڵکی بکەن، بۆ ئەوەی جادوو لەگەڵ موعجیزەی پێغەمبەران تێکەڵ نەبێ، کە ئەو کاتە دیارە جۆرێك لە ئیلتیباس‌و تێکەڵیی هەبووە لە مێشکی خەڵکیداو پێیان وابووە کە موعجیزەی پێغەمبەرانیش وەك جادوو وایە، بۆیە خوا ئەو دوو فریشتەیەی ناردوون جادوو فێری خەڵك بکەن، بۆئەوەی دیار بێ جادوو چییە؟ وە

لەگەڵ موعجیزەی پێغەمبەران تێکەڵ نەبێت، کەواتە: ئەو دوو فریشتەیە کە ناویان (هاڕووت و ماڕووت) بووە، وەنەبێ سەرپێچییان لە فەرمانی خوا کردبێ،

بەڵکو ئەو کارەشیان هەر بە فەرمانی خوا کردوە، بەڵێ فریشتەکان هەموویان کڕنووش دەبەن جگە لە ئیبلیس، ئیبلیس سەرپێچیی کرد لە فەرمانی خواو خۆی بەزلگرتو لە کافران بوو، وە لەو ڕۆژەشەوە ئیبلیس ئیعلانی دوژمنایەتییەکی سەرسەختی کرد، لەگەڵ ئادەم ﷺ وە خێزانەکەی‌و، ئەو وەچەیەی کە لێیان پەیدا دەبێت.

ئنجا خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَقُلْنَا يَـٰٓـَٔادَمُ ٱسْكُنْ أَنتَ وَزَوْجُكَ ٱلْجَنَّةَ وَكُلَا مِنْهَا رَغَدًا حَيْثُ شِئْتُمَا وَلَا تَقْرَبَا هَـٰذِهِ ٱلشَّجَرَةَ فَتَكُونَا مِنَ ٱلظَّـٰلِمِينَ ﴾، واتە: وە گوتمان ئەی ئادەم خۆت‌و هاوسەرەکەت لە بە هەشتدا نیشتەجێ بن‌و لە هەر شتێك‌و لە هەر کوێیەك ویستتان بەخۆشیی و فراوانیی لێی بخۆن، بەڵام توخنی ئەم درەختە نەکەون، ئەگەرنا لە ستەمکاران دەبن. هەڵبەتە لێرەدا یەکەمجارە باسی هاوسەرەکەی ئادەم دەکرێ، کە لە سوننەتی پێغەمبەردا ﷺ هاتوە، ناوی (حەووا)یە، بەڵام لە قورئاندا ناوەکەی نەهاتوەو بەس هەر دەفەرموێ هاوسەرەکەی، جا جێی سەرنج ئەوەیە کە خوا پێشتر باسی چۆنیەتی دروستبوونی (حەووا)ی نەکردوەو یەکسەر باسی ئەوەی کردوە، کە هاوسەرەکەشی لە بەهەشتدا لەگەڵیدا بووە، جا هەرچەندە هەندێك لە زانایان دەڵێن: لە پەراسووی چەپی ئادەم حەووا دروست بووە، بەڵام لەڕاستیدا ئەو قسەیە هی تەوراتی گۆڕراو[1] (التوراة المحرّفة)یەو لەوێدا ئەو مەسەلەیە بە ڕاشکاوی باسکراوەو ئەوجۆرە زانایانە لەوێیان وەرگرتوە، وی بە هیچ جۆرێك لە قورئان ئەوە ناگەیەنێ، بۆ وێنە: یەکێك لەو ئایەتانەی کە لەوبارەوە دەدوێن ئەم

---

١) بڕوانە: (التفسير التطبيقي للكتاب المقدّس)، العهد القديم، سفر التكوين الإصحاح: ٢/٢١، ص (١١)، کە لەژێر ناونیشانی (خلق المرأة) دەڵێ: (فأوقع الربُّ الإله آدمَ في نومٍ عميق، ثم تناول ضِلْعاً من أضْلاعِه وَسدَّ فكانَها بالّلحم)، واتە: ئنجا پەروەردگاری پەرستراو خەوێکی قووڵی لە ئادەم خست، پاشان یەکێك لە پەراسووەکانی دەرهێناو شوێنەکەی بە گۆشت پڕکردەوە.

تێبینی: ئەو نوسخەیەی: (الکتاب المقدس) کە من لێی نەقڵ دەکەم چاپی ساڵی: (٢٠٠٢) شرکة ماستر میدیا، چونکە نوسخەکانی زۆرجار جیاوازن.

ئایەتەیــە: دەفــەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِى خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ وَخَلَقَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا ...﴿١﴾﴾النساء، واتە: ئەی خەڵكینە! پارێز لەو پەروەردگارەتان بكەن، كە هەمووتانی لە نەفسێك دروستكردووەو هەر لە خۆیشی هاوسەرەكەی دروستكردوە، دیارە وشەی: ﴿مِنۡهَا﴾، واتە: لەو نەفسە، (نەفس) (مُؤَنَّث)ەو مەبەست پێی ڕووحی ئادەمە، ئاشكراشە (حەووا) لە ڕووحی ئادەم جیانەبۆتەوە، چونكە ڕووح بەش نابێت! كەواتە: یانی: لە جینسی ئەو نەفسەو لە جینسی ئەو ڕووحەو، لە جینسی ڕووحو نەفسی ئادەم خوا (حەووا)شی دروستكردوە، كەواتە: ئەوە ئایەتە كەموزۆر ئەوە ناگەیەنێ كە (حەووا) لە ئادەم جیا بووبێتەوە، ئنجا ئەو فەرمایشتانەی پێغەمبەریش ﷺ كە باسی ئەوە دەكەن، ئەوە مەبەست پێیان (تَشْبِيه) كردنی ئافرەتە بە پەراسووەوە، بۆ وێنە: دەفەرموێ: {(إِنَّ الْمَرْأَةَ كَالضِّلَعِ) (رَوَاهُ مُسْلِم بِرقم: (٣٦٢٩)، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ}، واتە: ئافرەت وەك پەراسوو وایە، وە لە فەرموودەیەكی دیكەدا كە (بخاري و مسلم) هێناویانە، دەفەرموێ: ئافرەت لە پەراسوو دروستكراوە[1]، واتە: ئافرەت لە شێوەی پەراسوودا دروستكراوە، لە چ ڕوویێكەوە؟ لەو ڕووەوە كە پەراسووەكان لارنو بەهۆی لارییەكەشیانەوە توانیویانە قەفەزەی سینگ دروست بكەن، بەهەمان شێوە ئافرەتیش لارە، لەو ڕووەوە كە عاتیفەی بەسەر عەقڵیدا زاڵە، ڕەحمو بەزەیی زیاترە لە عەقڵو بیرو هۆشی، چونكە ئەركێك كە بە ئافرەت سپێردراوە، زیاتر پێویستی بە عاتیفەو بەزەیی هەیە، ژن پێویستی بەوە هەیە عاتیفەو بەزەییو سۆزێكی زۆری هەبێ، ئەگەرنا ئەركیماڵدارییو ئەركی منداڵ بەخێوكردنی بۆ بەڕێوە ناچێت، كەواتە: لە حەدیسەكانیشدا ئافرەت وێچوو (تَشْبِيه) كراوە بە پەراسوو، نەك بڵێن: ئافرەت لە پەراسوو دروست كراوە، ئنجا دیارە فەرموودەكە باسی حەوواء ناكات بەتایبەتن بەڵكو باسی ئافرەت دەكات بە گشتیو دەفەرموێ:

---

١) ئەمەش دەقی فەرموودەكەیە: ((استوصوا بالنّساء خيراً، فإنَّ المرأة خُلِقَتْ من ضِلَعٍ، وإنَّ أعوجَ شيءٍ في الضِّلَعِ أعلاه، فإن ذهبت تُقيمُهُ كَسَرْتَهُ، وإنْ تركته لم يزلْ أعوجَ ، فاستوصوا بالنساء خيراً)) البخاري: ٥١٥٨ ، ومسلم: ١٤٦٨ .

(خُلِـقَتِ الـمرأة)، نـەك (خُلِـقَتِ حـواء)، بۆیـە هـیـچ دەقێکـی قورئـان سـوننەتمان بەدەستەوە نیە بلێ: (حەووا) لە ئادەم دروستبووە یاخود لە پەراسووی ئادەم دروست بـووە، بـەڵام ئـەوە لـە ئیـسرائیلیاتدا هەیـەو لـە تـەورات‌و هاووێنەکانیـدا باسکراوە، بەڵام لە قورئان‌و سوننەتدا شتی وانیە.



بەڵـێ خـوا ﷻ پێـی فـەرموون لـە هەرشتێك‌و لـە هـەر کوێیـەك دەتانـەوێ لـە بەهەشتدا ڕابوێرن‌و بەهرەمەندبن لە نـازو نیعمەتـەکان بـە فراوانیـی، بـەڵام یـەك درەختی لـێ قەدەغەکردن‌و فەرمووی لەم درەختـە مـەخۆن، جـا ئایـا ئـەم درەختـە چییە؟ توێـژەرانی قورئـان لـەوبارەوە زۆر شـتیان گوتـوە: یـەك دەڵـێ: سـێوە، یـەك دەڵـێ: ترێیـە، یـەك دەڵـێ: گەنمـە...هتـد، بـەڵام لەڕاسـتیدا ئـەو قسانە هـەموویان زیـادن، مـادام قورئـان و سـوننەتی پێغەمبـەر ﷺ (واتـە: وەحـی) نەیفـەرمووبێت، ئـەوی دیکـە هـەمووی (تفـەنگ بـە تاریکییـەوە نانـە)، ئنجـا هـیـچ شـتێکیش پـەکی لەسەر ئەوە نەکەوتوە، ئەگەرنا خـوای پـەروەردگار باسـی دەکـرد، ئـەمما ئەگـەر لـە تەورات‌و ئینجیلدا شـتێك بـاس کرابـێ، ئـەوە بێگومـان جێـی پشت پێبەسـتن نیـە، گرنگ ئەوەیە کە خوا درەختێکی لێ قەدەغە کردوون و فەرموویەتی: لێی مەخۆن! جـا ئایـا یـەك تاکـە درەخـت بـووە، یـاخود جـۆرە درەختێـك بـووە؟ هەنـدێك لـە توێژەرانی قورئان دەڵێن: جۆرە درەختێك بـووە، خـوای پـەروەردگار دانەیـەکی لـەو جۆرە درەختە پیشانی (ئادەم) و (حەووا) داوەو فەرموویەتی لەوە مەخۆن، بۆیەش دوایـی شـەیتان فێڵـی لێکـردوون‌و گوتوویـەتی: خـوا فەرموویـەتی: لـەو درەختـە مەخۆن، بەڵام ئەگەر هەر لەو جۆرە لـە درەختێکی دیکە بخۆن، قەیدێناکات! جـا هەنـدێك دەڵـێن: لـەو ڕووەوە ئـەوانیش بـەو (تأویـل)ە لـە خـشتە چـوون، دیاریـشە شەیتان سەرەنجام خوتخوتەیان بۆ دەکات لەو درەختە قەدەغەکراوەیان پـێ دەخـوا، وە بە خواردنیشیان لەو درەختە قەدەغەکراوە، وەك خـوای دادگـەر پێشتریش پێـی گوتبوون، کە دەبنە ستەمکار، کەسێکیش ستەمکار بێت شایستەی ئـەوە نیـە کـە لـە بەهەشتی خوا دابێ، بۆیە سەرەنجام موستەحەقی ئەوە دەبن کە خـوا لـە بەهەشـت وەدەریـان بنـێ، وەك دەفـەرموێ: ﴿ فَأَزَلَّهُمَا ٱلشَّيۡطَٰنُ عَنۡهَا فَأَخۡرَجَهُمَا مِمَّا كَانَا فِيهِ ﴾، واتە: شەیتان خلیسکاندنی بە هۆی ئەو درەختەوەو لەوەی تێیدا بوون وە دەرینـان،

دیارە شەیتان ئەوانی لە بەهەشت دەرنەکردو خوای بەرزو مەزن دەریکردن، بەڵام چونکە ئەو گوناهەی شەیتان پێی کردن و ئەو هەڵەیەی شەیتان پێی کردن، هۆکاری ئەوەبوو کە خوا سزایان بدات بەوەی کە لە بەهەشت دەریانکات، خوای کاربەجێ خودی شەیتانی بە دەرکەری ئەوان داناوە لە بەهەشت.



ئنجا خوا ﷻ بە (ئادەم و حەووا)ی فەرموو، وە بە ئیبلیسیشی فەرموو، وەك لە سیاقی ئایەتەکان کە لە شوێنەکانی دیکەدا هاتوون، دەردەکەوێ، بە هەموویانی فەرمووە: لە بەهەشت وە لە ئاسمان بچنە خوار﴿ ٱهۡبِطُواْ مِنۡهَا ﴾، چونکە ئەم ﴿ مِنۡهَا ﴾یە هەم بەهەشت دەگرێتەوەو، هەم ئاسمانیش دەگرێتەوە، واتە ئاسمان‌و بەهەشت بەجێ بێڵن، بچن بۆ سەر زەوی وە لەوێ نیشتەجێبن تا ماوەیەك، وەك لە ئایەتی دواتردا دەفەرموێ: ﴿ وَقُلۡنَا ٱهۡبِطُواْ بَعۡضُكُمۡ لِبَعۡضٍ عَدُوّٞۖ وَلَكُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ مُسۡتَقَرّٞ وَمَتَٰعٌ إِلَىٰ حِينٖ ﴾، وە پێمان گوتن: دابەزن هەندێکتان دوژمنی هەندێکتانن، لەو زەویدا نشینگەو گوزەرانێکتان دەبێ تا کاتێکی دیاریکراو، کە دیارە مەبەست پێی دوژمن بوونی ئیبلیسە بۆ ئەوان، ئیبلیس کە بۆخۆی ئیعلانی دوژمنایەتی‌و دژایەتی خۆی کردوە، وە ئەگەر مەبەست وەچەی ئادەمیش بێت، واتە وەچەی ئادەم کە کافرەکانن دژی ئیماندارانن، وە زاڵمەکان دژی مەزڵوومەکانن، بەڵام دیارە خوا ﷻ ئاوا لە ئادەم ناگەڕێ‌و ئیهمالی ناکات، بەڵکو چەند وشەیەکی فێرکردن کە ڕێگای پەشێمانبوونەوەی پێشاندان وەك، دەفەرموێ: ﴿ فَتَلَقَّىٰٓ ءَادَمُ مِن رَّبِّهِۦ كَلِمَٰتٖ فَتَابَ عَلَيۡهِۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ ﴾، ئادەم چەند وشەیەکی لە پەروەردگار خۆی وەرگرتن و ئەویش تۆبەی لێوەرگرت، بێگومان ئەو زۆر تۆبە وەرگری میهرەبانە. مەبەست لە (كَلِمَات) چەند وشەیەکە کە بەکاریان بێنێ تا بگەڕێتەوە بۆ لای خواو پەشێمان ببێتەوە، جا تەماشا بکەن! خوا ﷻ چەندە بەڕەحمە لەگەڵ بەندەی خۆی دا، لەحاڵێکدا کەپێی فەرموون لەو درەختە قەدەغەکراوە مەخۆن‌و ئەوان فەرمانی خوای خۆیان شکاندوەو بە قسەی دوژمنی خوایان کردوە کە (ئیبلیس)ە، لەگەڵ ئەوەشدا خوا ﷻ لەگەڵیان بەڕەحمەو چەند وشەیەکی

فێرکردن کە چۆن خۆیان لە گوناح ڕزگار بکەن؟ وە چۆن بگەڕێنەوە بۆ لای خوای پەروەردگاریان، بۆئەوەی خوا لێیان خۆش بێ؟



جا توێژەرانی قورئان زۆربەیان لەسەر ئەوەن کە ئەو وشانە ئەوانەن، کە لە سووڕەتی (الأعراف)دا هاتوون، کە دەفەرموێ: ﴿ قَالَا رَبَّنَا ظَلَمْنَآ أَنفُسَنَا وَإِن لَّمْ تَغْفِرْ لَنَا وَتَرْحَمْنَا لَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلْخَـٰسِرِينَ ﴿٢٣﴾ ﴾، واتە: (ئادەم و حەووا) هەردووکیان گوتیان: پەروەردگارمان ئێمە ستەممان لە خۆمان کرد، وە ئەگەر تۆ لێمان نەبووری وە بەزەییت پێماندا نەیەتەوە، بێگومان ئێمە لە زیانباران دەبین. ئەو وشانەیان گوتن وە خوای بەخشندە لە هەردووکیان خۆشبوو. جارێکی دیکە خوای تاك وپاك باسی دابەزینیان دەکات: ﴿ قُلْنَا ٱهْبِطُوا۟ مِنْهَا جَمِيعًا ۖ فَإِمَّا يَأْتِيَنَّكُم مِّنِّى هُدًى فَمَن تَبِعَ هُدَاىَ فَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴾، پێمانگوتن هەمووتان لێی بچنە دەرێ و شۆڕبنەوە بۆ زەوی، چونکە: (هبوط) ئەوەیە کە مرۆڤ لەسەرێ بێتە خوارێ، وەك پێشتر باسمان کرد لە ئاسمان و بەهەشت دەرکران و ڕەوانەی سەر زەوی کران، کە دیارە هەم لە ڕووی ماددییەوە لە ئاسمانەوە بێنە سەر زەوی، مانای وایە (هبوط)ەو، هەم لە ڕووی مەعنەوییەوە لە ژیانی نێو بەهەشت کە هەرچی نازو نیعمەتە تێیدایەو، هەرچی خۆشییە تێیدایە، لەگەڵ لە ژیانی سەر زەوی کە دەبێت بە ئارەقی نێوچەوانی خۆیان خۆیان بژیێنن، ئەوەش دیسان هاتنە خوارێکی مەعنەوییە، هەڵبەتە لە ئەنجامی گوناهیشدا تووشی ئەوە بوون، بۆیە ئەوە جۆرێکە لە دابەزینی مەعنەوییش، ئنجا خوا ﷻ هەواڵی پێدان ﴿ فَإِمَّا يَأْتِيَنَّكُم مِّنِّى هُدًى فَمَن تَبِعَ هُدَاىَ فَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴾، جا کە هەرکاتێ لەمنەوە ڕێنماییتان بۆ هات، واتە: بە پێغەمبەرانی خۆمدا (علیهم الصلاة والسلام) پەیامو کتێبم بۆ ناردن، ئەوە هەرکەس بە دوای ڕێنمایی من بکەوێ، نەترسی دەبێتو نەغەم و پەژارەی دەبێت، واتە بێ ترس دەبێت لە ئاییندەی خۆی کە خوا سزای بدات، وە غەم و پەژارەشی نابێت بڵێ ژیانەکەم لەدەستچوو، چونکە ژیانە دنیاییەکەی لەدەست ناچێ، بەڵکو بە ژیانەکەی بەهرەمەندە، وە ترسیشی

نیە لە سزاو جەزرەبەی خوا چونکە ئەوەی فەرمانبەربێ بۆ خواو فەرمانی خوای پەروەردگار جێبەجێ بکات، خوا (تبارك وتعالى) ڕێزی دەگرێ و سزای نادا، بەڵکو ڕێزی دەگرێ و ژیانی هەمیشەیی بەهەشتی پێ دەبەخشێ، بەڵام ئەوانەی کە بێ بڕوان و ئایەتەکانی خوا بەدرۆ بزانن دیارە ئەوانە دەبن بە هاوەڵو خاوەنی دۆزەخ وە بە هەمیشەی تێیدا دەمێننەوە: ﴿ وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَكَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَآ أُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِۖ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿٣٩﴾ ﴾.



## چەند مەسەلەیەکی گرنگ

**مەسەلەی یەکەم:** وەك باسمان کرد خوا ﷻ کە بە فریشتەکانی فەرمووە: جێنشینێك لەسەر زەوی دادەنێم، ویستوویەتی ئاگاداریان بکاتەوە، نەك پرس و ڕاوێژیان پێ بکات داخۆ دەڵێن چی؟! چونکە خوا ﷻ ڕاوێژ بە دروستکراوەکانی ناکات، کەسێك ڕاوێژ دەکا بە غەیری خۆی، کە زانیاری خۆی تەواو نەبێتو، بیەوێ بە زانیاری خەڵك زانیاری ناتەواوی خۆی تەواو بکات، یان عەقڵی ناتەواوی خۆی تەواو بکات، بەڵام خوای پەروەردگار کە هەموو شتێك دەزانێ، پێویستی بەزانیاری کەس نیە، وە بۆ خۆیشی زۆر بەڕاشکاویی بە ڕوونیی لە سووڕەتی (الأنبياء)دا فەرموویەتی: ﴿ لَا يُسۡـَٔلُ عَمَّا يَفۡعَلُ وَهُمۡ يُسۡـَٔلُونَ ﴿٢٣﴾ ﴾، واتە: پرسیاری لێ ناکرێ لەوەی کە دەیکاتو کەس ناتوانێ ڕەخنەی لێ بگرێو پرسیاری لێبکات نە کەس هەقی ئەوەی هەیە نە کەسیش لەو ئاستەدایە، بەڵکو ئەوانن کە لێیان دەپرسرێتەوە.

**مەسەلەی دووەم:** ئادەم جێنشینی خوایە، جا هەندێ لە توێژەرەوانی قورئان گوتوویانە: چۆن دەبێ ئادەم جێنشینی خوا بێت؟! لە حاڵێکدا کە خوا خۆی هەمیشە زیندووی مشۆرگێڕ (الحيّ القيوم)ەو، نەشمردوە تاکو جێنشینی لە شوێنی خۆی دابنێ! بەڵام لەڕاستیدا ئەوە قیاسکردنی بەدیهێنەر (خلق)ە لەسەر دروستکراو (مخلوق)، چونکە دروستکراوەکان یان لەبەرئەوەی بێتوانا (ضعیف)ن، یان لەبەر ئەوەی کە دەمرن، جێنشین لە شوێنیان دادەنێن، بەڵام

خوا ﷻ لە هیچ کام لە سیفەتەکانیدا لە مەخلووقەکانی ناچێ، وەك فەرموویەتی: ﴿ ... لَيْسَ كَمِثْلِهِۦ شَيْءٌ ... ﴾ (١١) واتە: هیچ شتێك  وەك خوا نیە، وە خوا وەك هیچ شتێك لە دروستکراوەکانی نیە، جا دیارە لە خەلیفە دانانیشدا بە هەمان شێوە، ئنجا ئەگەر ئادەم جێنشینی خوا نەبێ، دەبێت جێنشینی کێ بێت؟ هەندێك دەڵێن: جێنشینی (جن)ە، بەڵام ئەوە ڕاست نیە، چونکە جینن و ئینسان پێکەوە هاتوونەتە سەر زەوی، وەك خوای بێ وێنە لە سوورەتی (البقرة)دا دەفەرموێ: ﴿ وَقُلْنَا ٱهْبِطُواْ بَعْضُكُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ وَلَكُمْ فِى ٱلْأَرْضِ مُسْتَقَرٌّ وَمَتَٰعٌ إِلَىٰ حِينٍ (٣٦) ﴾، واتە: وە گوتمان: دابەزن هێندێکتان دوژمنی هێندێکتانن... بەڵێ، ئادەم و ئیبلیس بەیەکەوە دابەزیونە سەر زەوی و زەوییان ئاوەدان کردۆتەوە، کەواتە: جند[1] لە پێش ئادەم لەسەر زەوی نەبوون، تاکو ئینسانەکان ببنە جێنشینی ئەوان، ئەمە یەك.

دووەم خۆ جینن سەر زەوییان بەجێنەهێشتوە تا بڵێین ئینسان هاتۆتە جێیان، بەڵکو ئەوانیش هەر لەسەرەتاوە لەگەڵ مرۆڤ پێکەوە لەسەر زەوی نیشتەجێبوون، ئنجا ئەگەر ئادەم بووبا بە جێنشینی (جن)، ئەوە مەقامێکی هێندە بەرز نەبوو کە فریشتەکان خۆزگەی پێ بخوازن، چونکە (جن) مەخلووقێکن لەخوار ئینسانەوە، بە بەڵگەی ئەوەی کە خوا هیچ کام لە پێغەمبەرانی لەوان نەناردوون و، پێغەمبەران هەموویان لە ئادەمیزادن، لە کاتێکدا کە پێغەمبەران بۆ ئینسان و (جن) هاتوون، کەواتە: ئینسان مەخلووقێکی بەرزترە لە (جن) {وەك لە کتێبی: (خواپەرستیی ئیسلامیی) لە بەرگی یەکەمدا، بە تەفصیلێ باسم کردوە}.

**مەسەلەی سێیەم:** فریشتەکان چۆن زانیان کە ئادەم و وەچەی ئادەم لەسەر زەوی ئاشووب دەگێڕن و، خوێن دەڕێژن و، خراپە دەکەن؟ هەندێك دەڵێن: ئەوە لەبەر ئەوەی پێش ئینسان (جن) هەبوون لەسەر زەوی و خراپەیان کردوە، بۆیە

---

١) هەرکام لە وشەی (جینن)و (جند) لە کوردەواریی دا بۆ (جنّ) بەکاردێن و، هەندێکیش وشەی (پەری) بۆ (جن) بەکاردێنن، بەڵام من پێم وایە، پەری تەرجەمەی (حۆری)یە.

گوتوویانە: ئەوەی کە ببێتە جێنشینیان ئەویش وەك ئەوان خراپە دەکات، بەڵام وەك پێشتر گوتم لەڕاستیدا (جن) لەپێش ئینسان لەسەر زەوی نەبووە، وە هیچ



پێویستیش بەوە ناکات، چونکە هەر کە خوا فەرموویەتی ئادەم لەسەر زەوی دەکەمە جێنشین، یەکسەر بۆشی پێناسە کردوون، ئادەم کێیە؟ وە چۆنە؟ چۆنیەتی پێکهاتەکەی‌و ڕووح‌و جەستەکەی چۆنە؟ چۆن هەم خێری لەدەستدێ، هەم شەڕی لەدەستدێ ! ئیدی لەوەوە فریشتەکان ئەوەیان هەڵهێنجاوە، کە ئینسان خراپەکردنی لە باردا هەیە.

**<u>مەسەلەی چوارەم</u>:** هۆکاری شایستەیی ئادەم و وەچەکەی، بۆ ئەوە کە ببنە جێنشینی خوا لەسەر زەوی، ئەوەبووە کە زانیارییەکیان هەیە کە فریشتەکان نیانە، وە لەڕاستیدا ئەو زانیارییە بریتیە لەوەی کە ئینسان بۆخۆی وەدەستی دێنێ کە لەڕێی بەکارهێنانی عەقڵ و پێنج هەستەکانەوە، زانیاری‌و ئەزموون وەدەست دێنێ، زانیاری بە شتە ماددییەکان وەدەست دێنێ، وە خوا ئەو جۆرە توانایەی نەداوەتە فریشتەکان، وە ئەوەش بۆمان دەردەخات کە بەڕاستی زانیاری مەقامێکی زۆر بەرزی هەیە لە خودی خۆیدا، چونکە خوا ﷻ بۆ ئیسپاتی ئەوە کە ئادەم شایستەی ئەوەیە جێنشینی بێت لەسەر زەوی، ئەوەبوو کە زانیاری ئادەمی کردە بەڵگەو ئادەمی کرد بە مامۆستای فریشتەکان، ئنجا دوایی بە فریشتەکانی فەرموو: کڕنووشی ڕێزگرتن بۆ ئادەم بەرن، وە کڕنووشی فریشتەکان بۆ ئادەم بە دڵنیاییەوە، کڕنووشی ڕێزگرتن و کڕنووشی تەحییەو سڵاو لێکردنە، چونکە لە قورئاندا کڕنووش هەر ئەوە نیە سەر بخەیە سەر زەوی، بەڵگەش لەوبارەوە ئەم ئایەتەیە کە دەفەرموێ: ﴿ أَوَلَمْ يَرَوْا إِلَىٰ مَا خَلَقَ اللَّهُ مِن شَيْءٍ يَتَفَيَّأُ ظِلَالُهُ عَنِ الْيَمِينِ وَالشَّمَائِلِ سُجَّدًا لِّلَّهِ وَهُمْ دَاخِرُونَ ﴿٤٨﴾ ﴾ النحل ، واتە: ئایا نابینن بۆ هەر شتێك کە خوا دروستی کردوە، سێبەرەکەی لەلای ڕاست‌و چەپ کڕنووشی دەبا وە بە ملکەچی سەجدە دەبا بۆ خوا، وەك دەبینین: کە دارو درەخت‌و شتی دیکەش کە دەنوشتێنەوەو بەملاو بەولادا دەچن، خوا ئەوەی داناوە بە کڕنووش بردن، واتە: هەر ئەسڵی چەمینەوەو دوولا هاتنەوەو

نووشتانەوە، بە سەجدە لەقەڵەم دراوە، هەروەها لە سوورەتی (یوسف) لە ئایەتی (١٠٠)دا، دەفەرموێ: ﴿ وَرَفَعَ أَبَوَيۡهِ عَلَى ٱلۡعَرۡشِ وَخَرُّواْ لَهُۥ سُجَّدٗاۖ ﴾، واتە: باب‌و دایکی بەرزکردەوە بۆسەر کورسیەکەی‌و ئەوانیش بۆی کەوتنە کڕنووش، جا دیارە لەسەر کورسی سوجدە نابردرێ، بەڵکو دەستیان بۆ بەسینگەوە ناوە، یان خۆیان چەماندۆتەوە، کە ئەوە جۆرێك بووە لە تەحییەو سڵاو.



**مەسەلەی پێنجەم:** کڕنووش نەبردنی ئیبلیس بۆ ئادەم ؈ بەهۆی خۆ بەزلگەرییەوە بووە، وەك لەم ڕستەیەدا دەردەکەوێ: ﴿ أَبَىٰ وَٱسۡتَكۡبَرَ وَكَانَ مِنَ ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴾ وە بە هۆی حەسەدەوە بوو، وەك لە سوورەتی (الإسراء)دا دەفەرموێ: ﴿ قَالَ أَرَءَيۡتَكَ هَٰذَا ٱلَّذِي كَرَّمۡتَ عَلَيَّ ...﴿٦٢﴾ ﴾، واتە: ئایا ئەم دروستکراوە دەبینی کە بەسەرمندا ڕێزت لێگرتوە! واتە ئیبلیس هەم خۆ بە زلگریی هەبوو، هەم حەسوودیی هەبوو، بۆیە زانایان دەڵێن: یەکەمین دوو گوناهێك کە لە ئاسمان کراون بریتی بوون لە خۆ بەزلگریی‌و حەسوودیی، ئەو دوو سیفەتە بە ڕاستی دوو سیفەتی زۆر خراپن، هەروەك یەکەمین گوناهیش کە لەسەر زەوی کرا، ئەوە بوو کە کوڕەکەی ئادەم ئەوەی کە سەدەقەکەی قەبووڵ نەکرا، حەسوودیی بە برایەکەی برد، وە لە ئەنجامدا کوشتی.

**مەسەلەی شەشەم:** ئەو باغە کە ئادەمی تێدا نیشتەجێبووە، ئایا مەبەست پێی چییەو لە کوێیە؟ سەرەتا دەڵێین: (جَنَّة)، واتە: باغ‌و بێستان، وە وشەی: (بەهەشت) وشەیەکی کوردەواریی خۆمانە بۆ باغ و بێستان بەکاری دێنین، واتە: بەهەشت ناوە بۆ ئەو باغە یان ئەو شوێنە خۆشەی، کە خوا بۆ ئیماندارانی داناوە، ئەگەرنا ئەسڵی وشەی (جَنَّة) لە قورئاندا، وە لە زمانی عارەبیدا، واتە باغ و بێستان‌و گوڵ‌و گوڵزار)، جا هەندێك لە زانایان گوتوویانە: ئەو باغە باغێك بووە لەسەر زەوی کە لە شوێنێکی بەرزبووە، نەك ئەو بەهەشتە بێت کە دوایی ئیمانداران دەچنە نێوی، وە لەوبارەوە چەند بەڵگەیەکیان هێناوەتەوە، یەکێك لەوانە دەڵێن: لەو بەهەشتەدا هیچ شتێك لە

ئینسان قەدەغە نیە، بەڵام لەو باغەدا خوا درەختێکی لێ قەدەغە کردوون، کە لێی نەخۆن، هەروەها چەند بەڵگەیەکیش دێننەوە، بەڵام لەڕاستیدا هەموو ئەو بەڵگانەی هێناویاننەوە، بایی ئەوە ناکەن کە ئیسپاتی ئەوە بکەن، ئەو شوێنە بەهەشت نەبووەو، باغێك بووە لە باغەکانی سەر زەوی، لەبەرئەوەی خوا کە باسی ئەو باغەمان بۆ دەکات، وەسفی ئەو باغە بەسەر هیچ کام لە باغەکانی سەرزەویدا ناچەسپێ، بۆ نموونە: خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ لَكَ أَلَّا تَجُوعَ فِيهَا وَلَا تَعْرَىٰ ﴿١١٨﴾ وَأَنَّكَ لَا تَظْمَؤُا فِيهَا وَلَا تَضْحَىٰ ﴿١١٩﴾ ﴾ طـه، واتە: ئەی ئادەم تۆ لەو باغەدا نەبرسیت دەبیٚو نە ڕووتیش دەبی، وە نە تینووت دەبێ نە گەرماشت دەبێت، دیارە باغی وا هەرگیز لەسەر زەوی نیە!

**مەسەلەی حەوتەم:** ئایا شەیتان چۆن توانی بچێتە نێو بەهەشت، تاکو خوتخوتەیان بۆ بکات؟ لە وەڵامدا دەڵێین: جارێ دەگونجێ شەیتان نەچووبێ، چونکە دەفەرموێ: ﴿ فَوَسْوَسَ إِلَيْهِ ٱلشَّيْطَٰنُ ...﴿١٢٠﴾ ﴾ طه، یانی شەیتان وەسوەسەی بۆ کرد، هەڵبەتە شەیتان دەتوانێ لە دوورەوەش خەیاڵاتو خوتخوتەی خۆی بخاتە دڵی ئینسانەوە، ئنجا ئەگەر چووبێش، ئەوە دیارە خوای کاربەجێ بەمەبەستی تاقیکردنەوەی ئادەم بواری داوەو، شەیتانیش تا ئەوکاتە هەر لە ئاسمان بووەو دانەبەزێنراوە بۆ سەر زەوی، کەواتە: دەرفەتی هەبووە بچێتە بەهەشتو، لەوێ خوتخوتەو خەیاڵات بەدڵی ئادەمو هاوسەرەکەیشی دابێنێ.

**مەسەلەی هەشتەم:** شەیتان وێڕای وەسوەسە، وەك لە ئایەتەکاندا دەردەکەوێ، قسەشی لەگەڵ (ئادەم و حەووا)دا کردوەو، وتووێژیشی لەگەڵدا کردوون، چونکە خوا دەفەرموێ: ﴿ فَوَسْوَسَ لَهُمَا ٱلشَّيْطَٰنُ لِيُبْدِيَ لَهُمَا مَا وُۥرِيَ عَنْهُمَا مِن سَوْءَٰتِهِمَا وَقَالَ مَا نَهَىٰكُمَا رَبُّكُمَا عَنْ هَٰذِهِ ٱلشَّجَرَةِ إِلَّآ أَن تَكُونَا مَلَكَيْنِ أَوْ تَكُونَا مِنَ ٱلْخَٰلِدِينَ ﴿٢٠﴾ وَقَاسَمَهُمَآ إِنِّي لَكُمَا لَمِنَ ٱلنَّٰصِحِينَ ﴿٢١﴾ ﴾ الأعراف، واتە: ((جا شەیتان بۆ ئەوەی ئەو ئەندامانەیان کە پێیان ناخۆش بوو دەربکەونو لێیان شێررابوونەوە بۆیان دەربخات، خوتخوتەی بۆ کردنو پێی گوتن: خوا بۆیە ئەوەی لێ قەدەغە

کـردوون، نـەوەك بـبن بـە دوو فریـشتە، یـان بەهەمیـشەیی بمێننـەوە﴿٢٠﴾ وە سوێندی بۆ خواردن کە مـن دڵسۆزتانم﴿٢١﴾ [illegible] فریویدان، مانـا وایە ئیبلیس ڕوو بە ڕووش چووە قسـەی لەگەڵدا کردوون.



**مەسەلەی نۆیەم:** ئـەوەی جێـی سـەرنجە ئەوەیـە کە لـە تـەوڕاتو لـە ئینجیلیـشدا بـاس دەکات، کـە شـەیتان پێـشێ (حـەووا)ی فریـودا ئنجا (حـەووا)ش ئـادەمی فریـودا، بـەڵام لـە قورئانـدا هەمیـشە هـەردووکیان پێکـەوە بـاس دەکات، وەك دەفـــــــەرموێ: ﴿فَلَمَّا ذَاقَا ٱلشَّجَرَةَ بَدَتۡ لَهُمَا سَوۡءَٰتُهُمَا وَطَفِقَا يَخۡصِفَانِ عَلَيۡهِمَا مِن وَرَقِ ٱلۡجَنَّةِ ﴿٢٢﴾﴾ الأعـراف، واتـە: جا کـاتێ لێیـان خـوارد عـەوڕەتی خۆیانیـان بـۆ دەرکەوتو، گەڵای درەختیان بە خۆیانەوە چەسپاند بۆئـەوەی عـەوڕەتی خۆیـان بـشارنەوە، وەك دیـاره هـەردووکیان بەیەکـەوە بـاس دەکـا، وە لـە کـاتی تۆبەکردنەکەشـدا دەڵـێن: ﴿قَالَا رَبَّنَا ظَلَمۡنَآ أَنفُسَنَا ...﴿٢٣﴾﴾ الأعـــراف، واتـــە: پـەروەردگارمان سـتەممان لـە خۆمـان کـرد ... کەواتـە: هەنـدێك لـە نووسـەرە عەلمانییـەکان کـە باسـی ئـەوە دەکـەن، دەڵـێن: دیـن ئیـسلام بـە سـەرچاوەی گونـاحو تـاوان دەزانـێ، چـونکە دەڵـێ (حـەووا) شـەیتان فریـوی داوەو دوایـی (حەووا)ش ئادەمی فریو داوە! قسەکەیان پووچو بێبنەمایـە، چـونکە لەڕاسـتیدا ئەوە قسەی دین نیەو قسەی ئەو کتێبانەیە کە دەستکاریی کراون، کە تەوڕات و (ئینجیـل)ن، بـەڵام لـە کتـێبی سـەلامەتو پـارێزراوی خـوای پـەروەردگاردا، کـە قورئانە، هەردووکیان بە خـەتابار دادەنێـتو دەڵـێ: هـەردووکیان پێکـەوە لێیـان خواردوەو، عەوڕەتی هـەردووکیان وێکـڕا دەرخـراوەو، هـەردووکیان بەیەکـەوەش پەشێمانبوونەوە ! لە (تەوڕات) لە (سیفری تەکوین)دا[1]، باسـی ئـەو مەسـەلەیە

---

١) بڕوانە: (التفسير التطبيقي للكتاب الـمقدّس) العهد القديم، سفر التكوين، الإصحاح: ٣، ص: (١٢،١٣) کە باس دەکات چۆن (مار) حەووای فریوداوەو لـە میـوەی درەختـە قەدەغەکـەی خـواردوەو پاشان داویەتی بە ئادەمو ئەویش لـێی خواردوە دەڵـێ: (... قطفت من ثمرها وأكلت، ثم أعطت زَوجَها أيضاً فأكتل معها ...).

دەکاتو باسی ئەوەش دەکات کە ئەو درەختەی قەدەغە کراوە (ئادەم)و (حەووا) لێی بخۆن، درەختی زانینی چاکەو خراپە بووە واتە درەختی (علم) بووە !



یانی: خوای کاربەجێ زانیاری فێربوونی لە (ئادەم) و (حەووا) قەدەغە کردوە !! هەڵبەتە هۆکارێکی گرنگی سەرهەڵدانی عەلمانییەتیش لە ڕۆژئاوا وەك ڕەوتێکی دژی ئایین، ئەو مەسەلەیە بوو، چونکە ئەوەتا لە تەوراتدا دەڵێ: خوا درەختی زانینی لە (ئادەم) و (حەووا) قەدەغە کردبوو کە لێی بخۆن[1] ! بەڵام لە ئیسلامدا نەك هەر شتی وانیە، بەڵکو بە پێچەوانەوە لە ئیسلامدا دەڵێ: خوا ئادەمی فێری زانستێك کرد کە فریشتەکان نەیاندەزانی، بۆیە شایستەی ئەوە بوو جێنشینی خوا بێت! بۆیەش سیکۆلاریزمو بێدینیی، ئەگەر لە ڕۆژئاوا زەمینەی هەبێت لەبەر ئەوەی دینەکەیان دژی عیلم بووەو، دینێکی ئەفسانەییو تێکدراوە، ئەوە لەڕاستیدا لە ئیسلامدا پێچەوانەیە. دیسان هەر لە (تەورات)دا لە (سیفری تەکوین) لە بەشی سێیەمیدا باسی بابەتێکی دیکەی ئەفسانەیی دەکات، دەڵێ: {کاتێك ئادەمو هاوسەرەکەی گوێیان لە دەنگی خوا بوو کە لەکاتی بەرەبەیاندا لە نێو بەهەشتدا پیاسەی دەکرد، خۆیان لەنێو درەختەکاندا پەنهان کرد، وە خوا بانگی ئادەمی کرد: ئایا لە کوێی؟ ئەویش گوتی: کە گوێم لە دەنگی تۆ بوو لە نێو باغدا ترسام، چونکە ڕووتم بۆیە خۆم شاردەوە، ئەویش (خوا) لێی پرسی: کێ پێی گوتی کە تۆ ڕووتی؟ مەگەر لەو درەختەی کە گوتم لێی مەخۆ خواردووتە؟ ئادەم گوتی: ئەو ژنەی کە پێت دابووم لە بەری ئەو درەختەی دامێو خواردم، ئنجا خوا فەرمووی: ئێستا ئادەم بەهۆی زانستی چاکەو خراپەوە، وەك یەکێك لە ئێمەی لێهاتوە، جا نەوەك دەستی بگاتە درەختی ژیانو لەویش بخواتو بۆ هەمیشە بمێنێتەوە، بۆیە خوا

---

١) کە دەڵێ: ( ... فأکل معها فانفتحت للحال أعينهما فأدركا أنَّهما عُريانين...) العهد القديم، الإصحاح : ٣/ ٦،٧ ، ص(١٣)، لە شەرحەکەشیدا گوتراوە: (أراد الشيطان أن يُبَيِّنَ لحواء أنَّ الخطيَّة لذيذة، فمعرفة الخير والشرّ تبدو مرغوبة...)، کەواتە: بە پێی تەورات: ئەو درەختەی سەرەتا حەووا لێیخواردوو پاشان دەرخواردی ئادەمیشی دا ، درەختی زانینی خێرو شەڕ بووە !

لە باغی (عدن) دەریکرد، تاکو لەسەر ئەو زەوییەی کە لەوێ وەرگیرابوو[١]، سەرگەرمی جوتیاریی بێت[٢].



**مەسەلەی دەیەم:** ئەوەیە کە وشەی: ﴿ اَهْبِطُواْ ﴾، بۆچی دووجار دووبارە بۆتەوە؟ وەڵامەکەی ئەوەیە کە جاری یەکەم پێش تۆبەکردنەو، هی دووەم دوای تۆبەکردنە، واتە: هەر لە سەرەتاوە کە لە درەختەکەیان خوارد، خوا فەرمووی: دابەزن، وە دوای ئەوەش کە ئادەم تۆبەی کردو گەڕایەوەو خوا ﷻ لێی خۆشبوو، دووبارە فەرمووی: دابەزن، تاکو ئادەم وا نەزانێ، کە بەهۆی تۆبەکردنەکەیەوە، سزای گوناهەکەی لەسەر لاچووەو بۆی هەیە لە بەهەشتدا بمێنێتەوە.

**مەسەلەی یازدەیەم:** خوا ﷻ بە بەشەریەتی ڕاگەیاندوە کە ئەگەر بەدوای هیدایەتی خوا بکەون، نە ترسیان دەبێت وە نە غەمو پەژارەشیان دەبێت، واتە: لە کاتێکدا پابەند دەبن بە شەریعەتی خواوە، ترسیان نابێ بە نیسبەت دواڕۆژ، وە غەم و پەژارەشیان نابێ نابێت بە نیسبەت دنیایانەوە، نە ترسیان لە دواڕۆژ دەبێت کە تووشی سزای خوا بن،و، نە غەمو پەژارەش بۆ ژیانی دنیا دادەگرن، کە پێیان وایە ژیانەکەیان لەدەست چووە، چونکە لە ڕاستیدا ژیانێکی دنیایی کە ئینسان نەتوانێ ڕەزامەندیی خوای تێدا وەدەستبێنێ، جێی خۆیەتی کە ئینسان غەمو پەژارەی بۆ دابگرێ، چونکە تاکە فرسەتێك کە دەیتوانی ڕەزامەندیی خوای بەبەزەیی تێدا بەدەست بێنێ، لە دەستی چووە!

خوای بەخشندە لەو کەسانەمان بگێڕێ کە بەهۆی پابەندیی بە هیدایەتی خواوە، بەختەوەریی و ژیانی دنیاو سەرفرازیی ڕۆژی دوایی بەدەست دێنن، ئامین.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ..

---

(١) واتە: جەستەکەی لە خاکی ئەو زەوییە وەرگیراوە.

(٢) سەرچاوەی پێشوو، العهد القديم، سفر التكوين، الإصحاح: ٣/ ٨، ٩، ١٠، ١١ ،١٢، ١٣ ...، ٢٣ ، ٢٤، ص: (١٣ ،١٤ ،١٥ ،١٦)

# دەرسی نۆیەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان تەرخان دەكەین بۆ تێوەڕامانێكی بەسەرهاتی ئادەم سەلامی خوای لێ بێت و، ئیبلیس نەفرینی خوای لەسەر بێت، ئەگەر تەماشای ئەو بەسەرهاتەی ئادەم بكەین، وەك لە ئایەتەكانی ژمارە (٣٠ تا ٣٩)دا هاتوە، كە لە دەرسی ڕابردوودا تەفسیرمان كردن، ئەگەر تێیانەوە ڕابمێنین، چوار ڕاستی گەورەو گرنگمان دەكەونە بەرچاو، هەڵبەتە زیاتریش، بەڵام من چوار ڕاستی گەورەو گرنگم لێ وەرگرتوون.

## ئەو ڕاستییانەی لە بەسەرهاتی ئادەم و ئیبلیس وەردەگیرێن

**ڕاستی یەكەم:** جێنشینی خوا بوونی ئادەم، گەورەترین و بەرزترین ڕێزو پلەو پایەی خۆی و وەچەكەی دەگەیەنێت، چونكە باسمان كرد كە خوای بەرزو مەزن بە ڕوون و ڕاشكاویی ڕایدەگەیەنێت كە بە فریشتەكانی فەرمووە: جێنشینێك بۆخۆم لەسەر زەوی دادەنێم، سیاقی ئایەتەكانیش وا دەگەیەنێ كە ئەو جێنشینە، جێنشینی خوایە ﷻ، وە پێشتر باسمان كرد كە هەرجۆرە مانایەكی دی بۆ وشەی خەلیفە، غەیری ئەوە كە خەلیفەی خوایەو جێنشینی خوایە، هیچ بەڵگەیەكی لەسەر نیەو پێچەوانەی سیاقی ئایەتەكانیشە، جا ئەوە كە ئادەم (سەلامی خوای لەسەر بێت) جێنشینی خوایە لەسەر زەوی، لەڕاستییدا گەورەترین ڕێزو حورمەتەو بەرزترین پلەو پایەی تێدایە، هەم بۆ (ئادەم) و (حەووا)ی هاوسەریشیو، هەم بۆ وەچەكەشیان، واتە: بۆ هەموو بەشەر، كە دیارە ئادەم و حەووا باب و دایكیانن، بۆچی؟ چونكە ئێمە پێشتر باسمان كرد كە وشەی (الخِلافة) یانی: (النِّیابَة عَنِ الغَیر)، واتە: جێگرایەتی كردنی

کەسێك بۆ کەسێکی دیکە، جا قورتوبی کە یەکێکە لە توێژەرانی ناوداری قورئان لە تەفسیری ئایەتی: ﴿ وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَٰٓئِكَةِ إِنِّى جَاعِلٌ فِى ٱلْأَرْضِ خَلِيفَةً ﴾دا دەڵێ: {وَالـمَعْنَيُّ بِالخَلِيفَةِ هُنَا فِي قَولِ ابْنِ مَسْعُودٍ وابنِ عَبَّاس وجَمِيعِ أَهْلِ التأويل، هُوَ آدَمُ عليه السلام، وَهُوَ خَلِيفَةُ الله فِي إمضَاءِ أَحْكَامِهِ وَ أوامِرِهِ}[1]، واتە: مەبەست لە خەلیفە هەم لەلای عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود خوا لێی ڕازی بێ (کە هاوەڵێکی زۆر ناوداری پێغەمبەرە ﷺ و زۆر شارەزا بووە لە قورئاندا)، وە لە لای عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (خوا لە خۆی و بابی ڕازی بێ) (کە ئەویش بە هەمان شێوە بە تەرجومانی قورئان ناودارە) وە سەرجەم ئەهلی تەفسیر دەڵێن: مەبەست لە (خلیفة) لێرەدا ئادەمە، جا دوایی ڕوونی دەکاتەوەو دەڵێ: (وَهُوَ خَلِيفَةُ الله فِي إمضَاءِ أَحْكَامِهِ وَ أَوامِرِهِ)، واتە: ئادەم جێگری خوایە لە جێبەجێ کردنی یاساکانی و فەرمانەکانیدا، واتە کە دەگوترێ: ئادەم خەلیفەی خوایە، مەبەست ئەوەیە کە بە فەرمانی خوا، یاساکانی خوا لەسەر زەوی پیادە بکات و فەرمانەکانی خوا جێبەجێ بکات، جا بەڕاستی ئەرك لەوە گەورەتر نابێت کە ئینسان بە فەرمانی خوا بژیێ، وە بە فەرمانی خوا شەریعەتی خوا جێبەجێ بکات، وە لەجیاتی خوا سەر زەوی ئاوەدان بکاتەوە! وە لە سوورەتی (الأحزاب)دا کە خوا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّا عَرَضْنَا ٱلْأَمَانَةَ عَلَى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱلْجِبَالِ فَأَبَيْنَ أَن يَحْمِلْنَهَا وَأَشْفَقْنَ مِنْهَا وَحَمَلَهَا ٱلْإِنسَٰنُ إِنَّهُۥ كَانَ ظَلُومًا جَهُولًا ﴿٧٢﴾ ﴾، واتە: ئێمە سپاردەمان ڕانواند لەسەر ئاسمان و زەوی و چیاکان، بەڵام ئامادە نەبوون هەڵیگرن، وە لێی ترسان، بەڵام ئینسان هەڵیگرت، هەرچەندە ئینسان زۆر ستەمکارو نەفامە، مەبەست لە ئەمانەت لەم ئایەتانەشدا جێبەجێکردنی ئەرکی جێگرایەتی و خیلافەتی خوایە ﷻ لەسەر زەوی، بۆچی؟ چونکە خوا دەفەرموێ: ئێمە ئەمانەتمان ڕانواندو پێشانی ئاسمانەکان و زەوی و شاخەکانماندا، بەڵام ئامادە نەبوون هەڵیگرن و

١) الجامع لأحكام القرآن، ج ١، ص (٢٥٨).

لێشی ترسان، دیارە لێرەدا خوای کاربەجێ دەیەوێ نواندنێکمان پێشانبداو شتێکمان بۆ وێنا بکات، ئەگەرنا بێگومان ئەگەر خوای پەروەردگار بە ئاسمانەکان و زەوی و چیاکان بفەرموێ: فلاّن ئەرکە جێبەجێ بکەن، ئەوە هیچ دروستکراوێك لاموجیبی نیە لە بەرانبەری فەرمانی خوادا !! کەواتە: لێرەدا کە دەفەرموێ: ﴿ فَأَبَيْنَ أَن يَحْمِلْنَهَا ... ﴾ ئامادە نەبوون هەڵیگرن، واتە نەیانتوانی هەڵیگرن و خوای زاناو توانا لە ئەسڵدا ئامادەیی هەڵگرتنی ئەو ئەمانەتەی تێدا نەخوڵقاندبوون، وە ڕستەی: ﴿ وَأَشْفَقْنَ مِنْهَا ... ﴾، یانی: ئەگەر خاوەنی ئیرادە بوونایەو خاوەنی عەقڵ و هەست بوونایە، لێی دەترسان، ئەو ئەمانەتە هێندە قورسە، بەڵام ئینسان هەڵیگرت، جا ئایا ئەو ئەمانەتە چییە کە ئینسان هەڵی گرتوەو، بە ئاسمانەکان و زەوی و چیاکان هەڵنەگیراوە؟ بەڕای من ئەوەیە کە ئینسان بە ئیرادەو ویستی خۆی بەرێوە بچێ، وە بە ئیرادەو ویستی خۆی ئامادەبێت بەندایەتیی بۆ خوا بکا، دیارە بوونەوەر هەمووی بۆ خوا ملکەچەو هیچ شتێك نیە لە بووندا ملکەچ نەبێت بۆ خوا، بەڵام ئینسان ملکەچە بۆ خوا بە ئیرادەی خۆی و هەڵبژاردنی خۆی، هەروەها خوا ﷻ کە لە چەندان شوێن لە قورئاندا باسی ئەوە دەکات، کە تیکڕای بوونەوەری بۆ ئینسان دەستەمۆ کردوەو بۆی مەیسەر کردوە، ئەوەش دیسان هەر مەبەست پێی ئەوەیە کە خوا ئینسانی کردوە بە نوێنەر (نائب)و جێنشینی خۆی و هەموو بوونەوەری بۆ دەستەمۆو مەیسەر کردوە، وەك لە سوورەتی (الجاثیة)دا خوای زاناو کاربەجێ دەفەرموێ: ﴿ وَسَخَّرَ لَكُم مَّا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ جَمِيعًا مِّنْهُ ۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ﴿١٣﴾ ﴾، واتە: وە هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە بۆ ئێوەی مەیسەرو دەستەمۆ کردوە، بێگومان لەوەدا نیشانەی زۆر هەن بۆ کەسانێك کە بیربکەنەوە، وە لە سوورەتی (هود)دا خوای بێ هاوەڵ ڕاستییەك بەیان دەکات کە بوون (وجود) هەمووی (ئاسمانەکان و زەوی و ئەوەی نێوانیان)، بۆ ئەوە دروستکراوە، کە خوا ئینسانی تێدا تاقی بکاتەوە، وەك دەفەرموێ: ﴿ وَهُوَ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ فِي

سِتَّةِ أَيَّامٍ وَكَانَ عَرْشُهُ عَلَى الْمَاءِ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا ...﴿٧﴾﴾، واتە: خوا ئەو كەسەیە كە ئاسمانەكان و زەوی لە شەش ڕۆژان دا دروستكردوون، وە ئەوكاتە بارەگاكەی لەسەر ئاو بوو، تاكو تاقیيتان بكاتەوە: كامەتان كردەوەی باشترە! مەبەستیش لە شەش ڕۆژ، شەش قۆناغە چونكە (یوم) لە زمانی عەرەبیدا هەم مانای ڕۆژی سەر زەوی دەگەیەنێ، كە دوازدە سەعاتە، وە ئەگەر شەوەكەی لەگەڵ بێت بیستو چوار سەعاتە، وە هەم ماوەیەكی زەمەنیی درێژ دەگەیەنێ، بۆ وێنە: هەزار ساڵ، وەك لە سووڕەتی (الحج)دا دەفەرموێ: ﴿... وَإِنَّ يَوْمًا عِندَ رَبِّكَ كَأَلْفِ سَنَةٍ مِّمَّا تَعُدُّونَ ﴿٤٧﴾﴾، واتە: ڕۆژێك لای پەروەردگارت بە ئەندازەی هەزار ساڵە، لەو ساڵانەی كە ئێوە شتیان پێ حیساب دەكەن. بەڵكو ڕۆژ هەیە لە قورئان دا بەكارهاتوە، بە مانای پەنجا هەزار ساڵ وەك لە سووڕەتی (المعارج)دا دەفەرموێ: ﴿ تَعْرُجُ الْمَلَائِكَةُ وَالرُّوحُ إِلَيْهِ فِي يَوْمٍ كَانَ مِقْدَارُهُ خَمْسِينَ أَلْفَ سَنَةٍ ﴿٤﴾﴾، كەواتە: لە شەش ڕۆژاندا، یانی: بە شەش قۆناغ و لە شەش ماوەی زەمەنییدا، كە ئێمە نازانین ئەم قۆناغ و ماوە زەمەنییانە چەند بوون، جا ئایا حیكمەتی دروستكرانی كائینات چی بووە؟ ﴿لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا ... ﴿٧﴾﴾ هود، واتە: ئاسمانەكان و زەوی دروستكراون تاكو تاقیيتان بكاتەوە، داخۆ كامەتان كردەوەی باشترە! جا ئینسان هەتا بیر لەوبابەتە بكاتەوە هەڵدەگرێ! ئینسان زۆرجار، بە تایبەتی دوای بەرەو پێشچوونی زانستی گەردووناسیی، كە دەڵێ: ئەم زەوییەی ئێمە یەكێكە لە نۆ خڕۆكە كە بەدەوری خۆردا دەخولێنەوەو، پێیان دەگوترێ (كۆمەڵەی خۆر)، وە خۆر یەكێكە لەو ئەستێرانەی كە لەنێو مەجەڕڕەی كاكێشاندا خۆیان دەبیننەوە، كە دەڵێن سەد ملیۆن (١٠٠,٠٠٠,٠٠٠) ئەستێرەیە، جا هەیانە وەك ڕۆژو هەیانە گەورەترو یان گچكەتر، ئەو كاكێشانەی كە لە ئاسماندا دەبینین وەك پەڵە هەورێكە، ئنجا تا ئێستا دەڵێن زیاتر لە هەزاران كەهكەشانی وا دۆزراونەوە، كە هەر كامێكیان ملیۆنان ئەستێرەی تێدایە، وە هەر كام لەم ئەستێرانە، وەك ئەو خۆرەی ئێمە وایە،

یان گەورەترە یان بچووکترە، وە هەر کام لەو ئەستێرانەش چەندان خڕۆکە بە دەوریدا دەخولێنەوەو، هەر کام لە خڕۆکەکانیش، یان زۆربەیان، مانگیان هەن کە بە دەوریاندا دەخولێنەوە، وەك چۆن زەوی ئێمە مانگی هەیە!! ئینسان کە تەماشای زەوی و ئەهلی سەر زەوی و تەماشای خۆی دەکات، خۆی و زەوی زۆر بە بچووکی دێنە بەرچاو، لەچاو قەبارەی بوونەوەر، بەڵام لەراستیداو لەرووی مەعنەوییەوەو لەرووی جەوهەرو نێوەڕۆکەوە، زەوی گرنگییەکی تایبەتی هەیەو، ئینسانیش نابێت تەنیا بە قەبارەو ڕواڵەتی تەماشای بکرێ، بەڵکو دەبێت بە جەوهەرو نێوەڕۆکی تەماشای بکرێ، جا خوا ﷻ دەفەرموێ: هەموو بوونەوەرم بۆ ئەوە دروستکردوە ئینسانی تێدا تاقی بکرێتەوە، دیارە هەر لەو ڕوانگەیەشەوەیە کە خوای بەخشەر لە سووڕەتی (الإسراء)دا دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِيٓ ءَادَمَ وَحَمَلْنَٰهُمْ فِي ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ وَرَزَقْنَٰهُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَفَضَّلْنَٰهُمْ عَلَىٰ كَثِيرٍ مِّمَّنْ خَلَقْنَا تَفْضِيلًا ﴿٧٠﴾ ﴾، واتە: بێگومان ئێمە ڕێزمان لە وەچەی ئادەم گرتوەو لە وشکانیی و دەریادا هەڵمانگرتوون، (واتە: هۆکاری وامان بۆ ڕەخساندوون کە سواریان بن، لە وشکانیی و دەریادا) وە لە ڕزقە پاك و چاکەکان بەشمان داون و، بەسەر زۆر لە دروستکراوەکانماندا، (هەندێکیش دەڵێن: لێرەدا (كثیر) واتە: هەموو، یانی: بەسەر هەموو دروستکراوەکانماندا) هەڵمانبژاردوون.

هەروەها لە سووڕەتی (التین)یشدا دەفەرموێ: ﴿ لَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ فِيٓ أَحْسَنِ تَقْوِيمٍ ﴿٤﴾ ﴾، واتە: بە تەئکید ئینسانمان لە چاکترین شێوەو پێکهاتەی مادديی و مەعنەوییدا خوڵقاندوون، بەڵێ هەموو ئەو ئایەتانەو هاووێنەکانیان، ئەوە دەگەیەنن کە بەڕاستی جێنشینی خوا بوونی ئینسان - چونکە ئەگەر ئادەم جێنشینی خوا بووە، دیارە وەچەکەیشی هەر جێنشینی خوان لەسەر زەوی - وە ئەوە کە ئینسان هەڵگری ئەمانەتی خوایە، وە هەموو بوونەوەری بۆ ڕام و دەستەمۆ کردوە، ئەوانە هەموو ئەوە دەگەیەنن، کە بەڕاستی ئینسان خاوەنی پایەو مەقامێکی زۆر بەرزەو ڕێزو حورمەتێکی زۆر ناوازەی هەیەو،

پلەو پایەکی یەکجار بەرزی هەیە، وە بەڕاستی ئەو ڕێزو پایەو مەقامەی ئینسان لە ئیسلامدا هەیەتی، لە هیچ بەرنامەیەکدا نیەتی، تۆ تەماشا بکە بەرنامە ماددییەکان جاری وایە وا تەماشای ئینسان دەکەن، کە ئینسان هەر ئەوەندەیە لەسەر دوو پێیان دەڕوا، ئەگەرنا لەگەڵ ئاژەڵو زیندەوەران بە یەك جۆری دادەنێن! بەتایبەتی بیردۆزەکانی داریونیزم و فرۆیدیزم و تەنانەت مارکسیزمیش، ئەویش هەموو ژیانو پەرەسەندنی ئینسان دەگێڕێتەوە بۆ گەدەی و لایەنی ئابووریی و ماددیی، وە بەڕاستی ئەو بیردۆزە ئینسان کردانە زۆر لە ڕێزو مەقامی ئینسان دێننە خوارو، وەختێك بەراورد دەکەی لە نێوان ئینسانێکدا کە ئیسلام تەماشای دەکات، وە ئینسانێك کە بیردۆزەکان تەماشای دەکەن، دەبینی ئینسانی نێو بیردۆزەکان زۆر سووك و کەم بایەخە، لە حاڵێکدا کە ئینسان لە ئیسلامدا پایەیەکی زۆر بەرزی هەیەو جێنشینی خوایەو، هەڵگری ئەمانەتی خوایەو باشترین مەخلووقەو، لە چاکترین شێوەدا دروستکراوەو، ڕێزو حورمەتی لێنراوە، بەڵام ئایا ئەو ڕێزو حورمەتە، وە ئەو پایەو مەقامە بەرزە هەتاکەی بۆ ئینسان دەستەبەر دەبێ و مسۆگەر دەبێ و دەمێنێتەوە؟ خوای زاناو شارەزا لە سوورەتی (التین)دا بۆمان ڕوون دەکاتەوە، کە دەفەرموێ: ﴿ وَالتِّينِ وَالزَّيْتُونِ ﴿١﴾ وَطُورِ سِينِينَ ﴿٢﴾ وَهَٰذَا الْبَلَدِ الْأَمِينِ ﴿٣﴾ لَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنسَانَ فِي أَحْسَنِ تَقْوِيمٍ ﴿٤﴾ ثُمَّ رَدَدْنَاهُ أَسْفَلَ سَافِلِينَ ﴿٥﴾ إِلَّا الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ فَلَهُمْ أَجْرٌ غَيْرُ مَمْنُونٍ ﴿٦﴾ فَمَا يُكَذِّبُكَ بَعْدُ بِالدِّينِ ﴿٧﴾ أَلَيْسَ اللَّهُ بِأَحْكَمِ الْحَاكِمِينَ ﴿٨﴾ ﴾، واتە: ((سوێند بە هەنجیرو زەیتون ﴿١﴾ وە بە کێوی سینا ﴿٢﴾ وە بەو وڵاتە پڕ هێمنیی و ئاسایشە ﴿٣﴾ - کە مەبەست پێی مەککەو دەوروبەریەتی - بێگومان ئینسانمان لە باشترین شێوە پێکهاتندا خوڵقاندووە ﴿٤﴾ دوایی گێڕاومانەتەوە بۆ پلەی نزمی هەرە نزمان (بەهۆی کوفرەوە) ﴿٥﴾ جگە لەوانەی ئیمانیان هێناوەو کردەوەی باش دەکەن، ئەوانە پاداشتێکی نەبڕاوەیان هەیە ﴿٦﴾ جا ئایا دوای ئەمە کێ بەهۆی ئایینەوە بە

درۆت دەزانێ ؟ ﴿٧﴾ ئایا خوا کار بەجێترینی حوکمڕانەکان نیە ؟! ﴿٨﴾)).

کەواتە: بەهۆی ئیمان و کردەوەی باشەوە، ئینسان پارێزگاریی دەکا لەو پایەو مەقامە بەرزە کە خوا پێی داوە، بەڵام بە هۆی کوفرەوە لەدەستی دەدا، وەك خوا لە سوورەتی (الأنفال)دا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ شَرَّ ٱلدَّوَآبِّ عِندَ ٱللَّهِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فَهُمۡ لَا يُؤۡمِنُونَ ﴿٥٥﴾﴾، واتە: بێگومان خراپترین زیندەوەر لای خوا ئەوانەن کە بێبڕوان، چونکە ئیمان ناهێنن، ئنجا بۆ زانیارییتان ئەو ئەو ڕێزەی کە لە سوورەتی (الإسراء)دا خوا باسی کردوە، کە دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدۡ كَرَّمۡنَا بَنِيٓ ءَادَمَ وَحَمَلۡنَٰهُمۡ فِي ٱلۡبَرِّ وَٱلۡبَحۡرِ وَرَزَقۡنَٰهُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَفَضَّلۡنَٰهُمۡ عَلَىٰ كَثِيرٖ مِّمَّنۡ خَلَقۡنَا تَفۡضِيلٗا ﴿٧٠﴾﴾، ئەوە لە دنیادا کافرو مسوڵمان دەگرێتەوە، بەڵام ئەو ڕێزو پایەو مەقامە ئینسان لە دوارۆژدا لەدەستی دەدا، کاتێك لە دنیادا کوفر وەدەست دێنیٚ و خۆی بێبەش دەکا لە ئیمان، واتە: خۆی بێبەش دەکا لە بەندایەتیی بۆ خواو، خۆی بێبەش دەکات لە پەیوەندی ئیجابیی هەبوون لەگەڵ خوادا ﷻ، بەڵام بێگومان لەدەستدانی ئەهلی کوفر بۆ ڕێزو پایەیان لە دوارۆژداو بەهۆی کوفرەوە، پاساوی بێڕێزیی پێکرانیان نیە لە دنیادا، چونکە وای کاربەجێ بەگشتیو بە یەکسانیی لە دنیادا ڕێزی لە هەموو مرۆڤەکان گرتوە، وەك لە ئایەتی (٧٠)ی (الإسراء)دا ڕایگەیاندوە.

<u>**ڕاستی دووەم**</u> : کە لە بەسەرهاتی ئادەم ﷺ، وە بەسەرهاتی ئیبلیس وەدەستمان دەکەوێ، ئەوەیە کە بەڕاستی زانیاری (علم) مایەو هۆکاری بەرزی مرۆڤ و ڕێزو حورمەتیەتی، عیلم بە مانای فراوانی وشەی عیلم، هەم ئەو عیلمەی کە لە وەحییەوە دێت، کە بە تەئکید عیلمێك کە لە وەحییەوە سەرچاوە دەگرێ، عیلمێکی بێ خەڵتەیەو هیچ تۆزو گەردی تێکەڵ نەبووەو لێ نەنیشتوە، بە مەرجێك ئەو عیلمە ڕاست بێت هی وەحی بێتو دەستکارییش نەکرابێت، کە دیارە دوایین نوسخەی عیلمی وەحی کە لەبەردەستی بەشەریەتدا هەیە، ئەوەیە کە لە قورئان و سوننەتدا بەرجەستەیە، بەڵێ هەموو کتێبەکانی دیکە کە بۆ

پێغەمبەران هاتوون (علیهم الصلاة والسلام) بە عیلمی خوا هاتوون و وەحی خوا بوون، بەڵام دوایی دەستکاریی کراون و گۆڕدراون، بە تەئکید ئێستاش شتی ڕاستیان هەر تێدا ماوە، بەڵام شتی هەڵەشیان زۆر لەگەڵ خراوە، بۆیەش پێغەمبەر ﷺ لە فەرمایشتێکدا فەرموویەتی: {(لاَ تُصَدِّقُوا أَهْلَ الْكِتَابِ وَلاَ تُكَذِّبُوهُمْ) (رَوَاهُ الْبُخَارِيُّ برقم: (٤٤٨٥)، عَنْ أَبِي هُرَيرَةَ رضي الله عنه}، واتە: خاوەنی کتێبەکان نە بەڕاست بزانن و نە بەدرۆشیان بزانن، واتە: ئەو شتانەی کە پێتان دەڵێن مەڵێن: ڕاست دەڵێن، چونکە دەبینی ئەو شتەی کە ئەوان دەیڵێن بە ناوی وەحییەوە، بە ناوی کتێبی خواوە، گۆڕیویانە، وە مەشڵێن: درۆ دەکەن، دەبینی ڕاستەو بەشێك بووە لەو شەریعەت و بەرنامەیەی، کە بۆ پێغەمبەرانی پێشوو هاتوە، دیارە مەبەست لێرەدا ئەو شتانەن کە ڕاست و درۆیان دیارنەبێت، بەڵام بێگومان ئەوەی کە دیارو ئاشکرا بێت کە چەوت و ناڕاستە، وەك ئەو شیرك و کوفرو ئیلحادەی کە تێکەڵ بە کتێبەکانی خوایان کردوە، یان ئەوەی ڕاستەو ڕاست لەگەڵ عەقڵ تێك دەگیرێ، ئەوە بەبێ پەردەو بە ڕاشکاویی دەڵێین: ئەوە درۆیەو بەشێك نەبووە لە کتێبی خوا.

ئنجا ئایا چۆن دەزانین کە زانیاری مایەو هۆکاری بەرزی مرۆڤەو مایەی ڕێزو حورمەتیەتی؟ بەڵگە لەوبارەوە زۆرن، بەڵام ئێمە ئەم پێنجەیان لێ بە نموونە دێنینەوە:

**یەکەم/** لە تەفسیری ئەو ئایەتانەدا کە باسی بەسەرهاتی ئادەم دەکەن، باسمان کرد کە خوا ﷻ کاتێك فریشتەکان لێیان پرسی: ئایا حیکمەتی ئەوە چییە کە ئادەم دەکەی بە جێنشین لەسەر زەوی لە حاڵێکدا کە ئێمە هەمیشە سەرگەرمی ستاییش کردن و بە پاکگرتنتین؟ خوا ﷻ چی بە بەڵگە بۆ هێناونەوە؟ عیلمی ئادەم، وەك دەفەرموێ: ﴿ وَعَلَّمَ ءَادَمَ ٱلۡأَسۡمَآءَ كُلَّهَا ... ﴿٣١﴾ ﴾ البقرة، زانیارییەك کە ئادەم هەیبوو فریشتەکان نەیانبوو، خوا ئەوەی کردە بەڵگەو پاساوی ئەوە، کە ئادەم شایستەی ئەوەیە جێنشینی خوا بێت، چونکە عیلمێکی هەیە ئەی فریشتەکان، ئێوە نیتانە! کەواتە لەڕاستیدا

زانیارییە كە وا لە ئینسان دەكات بتوانێ جێنشینایەتی خوا بكا لەسەر زەوی، جا ئەگەر تەماشای واقیعی ژیانی بەشەرییەتیش بكەی هەروایە، كێ زیاتر دەسەڵاتی هەیە لەسەر زەوی؟ لەڕاستیدا ئەوانەی كە عیلمیان هەیە، چ عیلمی وەحی كە وەك گوتم عیلمێكی بێ خلتەیە، چ عیلمێك كە لە عەقڵ و لە ئەزموونەوە سەرچاوە دەگرێ، كە دیارە ئەو عیلمەی ئێستا زلهێزەكان كۆنتڕۆڵی سەر زەوییان پێكردووە و دەسەڵاتیان پێڕاناوە بەسەر زەویدا، زیاتر عیلمێكە لە عەقڵ و ئەزموونەوە سەرچاوەی گرتووە، بەڵام گرنگ ئەوەیە عیلمەو خوای زانا ئەوەشی ناو ناوە عیلم.

**دووەم:** ئنجا یەكەمین وشە، لە یەكەمین ئایەت لە یەكەمین سووڕەت، كە بۆ پێغەمبەری خاتەم هاتوە ﷺ بریتی بووە لە (إقرأ) بخوێنە:

﴿بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ٱقْرَأْ بِٱسْمِ رَبِّكَ ٱلَّذِى خَلَقَ ﴿١﴾ خَلَقَ ٱلْإِنسَٰنَ مِنْ عَلَقٍ ﴿٢﴾ ٱقْرَأْ وَرَبُّكَ ٱلْأَكْرَمُ ﴿٣﴾ ٱلَّذِى عَلَّمَ بِٱلْقَلَمِ ﴿٤﴾ عَلَّمَ ٱلْإِنسَٰنَ مَا لَمْ يَعْلَمْ ﴿٥﴾﴾ العلق، ئەوانە یەكەمین ئایەتێكن لە سووڕەتی (العلق) كە بۆ پێغەمبەری خاتەم ﷺ هاتوون، یەكەمین وشە لە یەكەمین ئایەت لە یەكەمین سووڕەت، كە بۆ پێغەمبەر هاتوە بریتیە لە: (بخوێنە)، واتە: زانیاری پەیدا بكە.

**سێیەم/** خوای پەروەردگار لە قورئاندا بۆ هیچ شتێك بە پێغەمبەری نەفەرمووە: داوا لە پەروەردگارت بكە بۆت زیاد بكات، تەنیا بۆ عیلم نەبێت، لە سووڕەتی (طه)دا دەفەرموێ: ﴿وَقُل رَّبِّ زِدْنِى عِلْمًا ﴿١١٤﴾﴾، واتە: وە بڵێ ئەی پەروەردگارم زانیارییم بۆ زیاد بكە، دیارە كە پێغەمبەر ﷺ لە مەككە ئەم ئایەتەی بۆ هاتوە، بەڵام هەتا وەفاتیشی كردوە، هەر خوا فەرمانی پێكردوە بڵێ: پەروەردگارم زانیارییم زیاد بكە، بەڵێ پێغەمبەری خاتەم ﷺ لە هەموو ژیانیدا تا وەفاتی فەرمووە، داوای لە پەروەردگاری كردوە كە زانیاری بۆ زیاد بكات، ئەوە مانای وایە زانیاری نیعمەتێكە دەبێت ئینسان هەمیشە هەوڵبدات زیاتری لێ وەدەست بێنێ، وە داوا لە خوای پەروەردگاری بكات،

چونکە (رَبّ) بەمانای پەروەردگارو مشوورخۆرە، کە بەردەوام بۆی زیاد بکات.

**چوارەم**/ ئنجا یەکەمین نیعمەتێك کە خوا ﷻ لە سوورەتی نیعمەتەکاندا باسی کردوە، بریتیە لە باسی عیلم، سوورەتی نیعمەتەکانیش سوورەتی (الرحمان)ە، کە بە (عروس القُرآن)یش بەناوبانگە، واتە: (بووکی قورئان) خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ٱلرَّحۡمَٰنُ ۝١ عَلَّمَ ٱلۡقُرۡءَانَ ۝٢﴾ الرحمن ، واتە: (خوای) خاوەن بەزەیی، قورئانی فێرکردوە، بەزەیی خوا ﷻ یەکەمین شت لە چیدا بەرجەستە دەبێت؟! لەوەدا کە قورئانی فێری ئینسانەکان کردوە، بەڵێ، فێرکردنی قورئان، یەکەمین نیعمەتی خوای پەروەردگارە.

**پێنجەم**/ دیسان خوای بێ وێنە عیلمی بە گەورەترین چاکەو نیعمەت داناوە، لەسەر پێغەمبەری خاتەم ﷺ، وەك لە سوورەتی (النساء)دا دەفەرموێ: ﴿...وَأَنزَلَ ٱللَّهُ عَلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡحِكۡمَةَ وَعَلَّمَكَ مَا لَمۡ تَكُن تَعۡلَمُۚ وَكَانَ فَضۡلُ ٱللَّهِ عَلَيۡكَ عَظِيمٗا ۝١١٣﴾، واتە: وە خوا کتێبو حیکمەتی بۆ سەر تۆ ناردۆتە خوار، (واتە: بەرنامەو کارامەیی لە جێبەجێکردنی بەرنامەدا) وە شتێکی فێرکردووی و زانیارییەکی بەتۆ بەخشیوە کە تۆ نەتدەزانی، وە بەخششی خوا لەسەر تۆ زۆر مەزنە، کە بریتیە لەچی؟ بریتیە لەوە کە عیلمێکی بەتۆ داوە ئەی موحەممەد کە تۆ نەتبووە، کەوابێ: لەڕاستیدا ئێمە وەك ئۆممەتی پێغەمبەر ﷺ، دەبێ زۆر بەجیددیی هەوڵبدەین زانیاری وەدەست بێنین، هەم زانیاری وەحی، کە لە قورئانو سوننەتدا بەرجەستەیەو، هەم زانیاری عەقڵیی و ئەزموونیی، چونکە ئەوەی کە بۆتە بەڵگەو پاساوی ئەوە کە ئێمە جێنشینی خوا بین لەسەر زەوی، ئەوەیە کە خاوەنی زانیاری بین، وە لەڕاستیدا سەرەنجام کەسێك دەبێتە پێشەواو دەبێتە سەر قافڵە بۆ بەشەرییەت، کە خاوەنی عیلم بێت، هەر بۆیەش کاتێ ئۆممەتی پێغەمبەر ﷺ کە هەم عیلمی کتێبی خوایان پێبووەو، هەم بەهۆی بەڕێوەچوون بەپێی ڕێنمایی و ئاڕاستەی کتێبی خواوە، عیلمی ئەزموونییشیان پەیدا کردبوو،

سەرقافڵەی بەشەرییەت بوون، وە بۆ هەر لایەك دەچوون، هەم عیلمی وەحییان بڵاو دەكردەوەو، هەم عیلمێك كە لە عەقڵ و ئەزموونەوە دەستگیردەبێ بڵاویان دەكردەوە، وە چاو ساغی مرۆڤایەتی بوون، كەچی ئێستا دوای ئەوەی كە ئۆممەتی پێغەمبەر ﷺ لە بواری زانستدا دواكەوتوون، بوونە پاشكۆو خەڵكی دیكە هاتۆتە پێش، كە عیلمێكی ئەزموونییان پێیە، عیلمێك كە لە عەقڵەوە پەیدا دەبێت، بەڵام چونكە ئاوێتە نیە لەگەڵ عیلمی وەحیدا، ئەوەتا بووەتە بەڵاو نیقمەت بۆ مرۆڤ، عیلمی ئێستا زیاتر بەشەر بۆچی بەكاری دەهێنێ و بەرهەمەكەی چییە؟ بەرهەمەكەی زیاتر بریتیە لە چەكی كوشندە، بریتیە لەو هەموو تەكنۆلۆژیا عەسكەرییەی كە هەڕەشە لە وجوودی بەشەر دەكا لەسەر زەوی، بۆچی؟ چونكە ئەو عیلمە لە وەحی و هیدایەتی خوا ﷻ ترازاوەو، هیدایەتی خوای زاناو توانای لەگەڵ ئاوێتە نیە.

**راستی سێیەم**: دیارە هەم ئیبلیس هەڵەی كردوەو، هەم ئادەمیش هەڵەی كردوە، بەڵام هەم لە پاڵنەری هەڵەی ئیبلیسداو، هەم لە پاڵنەری هەڵەی ئادەمداو، هەم لە سەرەنجامی هەڵەی هەردووكیاندا، جیاوازیی زۆر هەیە، با تەماشا بكەین بزانین چۆن؟ دیارە ئیبلیس هەڵەی كرد، كە كڕنووشی ڕێزگرتنی بۆ ئادەم نەبرد، بەڵام پاڵنەری ئەو هەڵەو گوناهەی چیبوو؟

١- ﴿أَبَىٰ وَٱسْتَكْبَرَ﴾، كەواتە: پاڵنەرەكەی خۆ بەزلگەریی بوو، وە لە سوورەتی (الإسراء)دا خوای دادگەر لەسەر زمانی شەیتان فەرموویەتی: ﴿قَالَ أَرَءَيْتَكَ هَٰذَا ٱلَّذِى كَرَّمْتَ عَلَىَّ لَئِنْ أَخَّرْتَنِ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ لَأَحْتَنِكَنَّ ذُرِّيَّتَهُۥٓ إِلَّا قَلِيلًا ﴿٦٢﴾﴾ الإسراء، واتە: دەبینی ئەوەی كە بەسەر مندا هەڵتبژاردوە... كەواتە: ئێرەیی (حَسَد)یش پاڵنەرێكی دیكەی بوو، كەواتە: خۆ بەزلگەریی و حەسوودیی، پاڵیان بە ئیبلیسەوەنا كە ئەو هەڵەیە بكات .

٢- پاشان هیچ كەسیش دەستی نەبووە لە هەڵەی ئیبلیسدا، بەڵكو بەس بۆخۆی دەستی تێدا هەبووە.

٣- سەرەنجامیش لەجیاتی ئەوەی دان بە هەڵەی خۆی دابێنێ، پاساوی دایەوە بە هەڵەیەکی دیکەی گەورەتر لەوەی پێشێ، وەك گوتراوە: (عوزر لە قەباحەت خراپتر) بۆچی؟! چونکە کاتێك خوای بێ هاوتا فەرمووی بۆچی کڕنووشت نەبرد؟ گوتی: ﴿ ...أَنَا۠ خَيْرٌ مِّنْهُ خَلَقْتَنِى مِن نَّارٍ وَخَلَقْتَهُۥ مِن طِينٍ ﴿١٢﴾ ﴾الأعراف، واتە: من لەوی چاکترم، چونکە منت لە ئاگر دروستکردوەو ئەوت لە قوڕ دروستکردوە، واتە خۆی بەسەر ئادەمدا هەڵکێشاو خۆی بە چاکتر زانی، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە ئیبلیس فەرمانەکەی خوای ﷻ هەر لە ئەسڵدا بە هەڵە زانیوە! واتە: ئەی خوایە تۆ فەرمانەکەت لە ئەسڵدا لە جێی خۆیدا نەبووە، چونکە من لە ئادەم چاکترم و نابێ من کڕنووش بۆ ئەو بەرم و، نابێ من ڕێز لەو بگرم.

**ئنجا پاڵنەری ئەو هەڵەو گوناهەی ئادەم و حەووا کردیان چیبوو؟**

١- ئەوان بەهۆی لەبیرچوونەوەوە تووشی هەڵە بوون، وەك خوای زاناو شارەزا لە سوورەتی (طه)دا، دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ عَهِدْنَآ إِلَىٰٓ ءَادَمَ مِن قَبْلُ فَنَسِىَ وَلَمْ نَجِدْ لَهُۥ عَزْمًا ﴿١١٥﴾ ﴾، واتە: پێشتر بە (ئادەم)مان ڕاگەیاند، بەڵام لەبیری چووەوە وە عەزیمەتمان پێوە نەبینی، کەواتە: هەڵەکەیان بەهۆی لەبیرچوونەوەوە بوو، نەك بەهۆی خۆ بەزلگریی وحەسوودیی یەوە.

٢- پاشان بەهۆی هۆکارێکی دەرەکییەوە بوو، وەك خوای مەزن لە سوورەتی (طه)دا، دەفەرموێ: ﴿ فَوَسْوَسَ إِلَيْهِ ٱلشَّيْطَٰنُ قَالَ يَٰٓـَٔادَمُ هَلْ أَدُلُّكَ عَلَىٰ شَجَرَةِ ٱلْخُلْدِ وَمُلْكٍ لَّا يَبْلَىٰ ﴿١٢٠﴾ ﴾، ئیبلیس خوتخوتەی بۆ کرد، واتە هەڵەکەی هەڵەیەکی خودیی نەبوو، بەڵکو لە دەرەوە بوو و بەهۆی کارتێکردنێکی دەرەکیی بوو.

٣- ئنجا دوایـیش ئـادەمو حـەووا دانیـان بـە هەڵەکـەی خۆیـان داهێنـاو هەڵەکەشـیان خسـتە ملـی خۆیـانو گوتیـان چـی؟ ﴿قَالَا رَبَّنَا ظَلَمْنَآ أَنفُسَنَا ... ﴿٢٣﴾﴾ الأعراف، واتە: گوتیان: پەروەردگارمان زوڵممـان لە خۆمـان کـرد، بـەڵام ئیبلیس هەڵەکەشـی گێڕایـەوە بـۆ لای خـوای پـاكو تـاك، وەك خـوا (تبـارك وتعالـی) بۆمان باس دەکـات لـە سـوورەتی (الحجـر)دا دەفـەرموێ: ﴿قَالَ رَبِّ بِمَآ أَغْوَيْتَنِي ... ﴿٣٩﴾﴾، واتە: پەروەردگارم بەهۆی ئەوەوە کە منـت گومڕا کـرد، کەواتـە: هـەم هـاندەرو پاڵنـەری هەڵـەکەو، هـەم سـەرەنجامەکەی ئـادەمو ئیبلیس، زۆر لێـك جیـان.

**ڕاستی چوارەم:** ئینسـان بـەهۆی گونـاحو خراپـەوە شـۆڕ دەبێتـەوە، بـەڵام بـەهۆی طـاعەتو چاکەوە بەرز دەبێتەوەو ڕێزو حورمـەت پـەیدا دەکـات، تەماشا بکـەن خـوا ﷻ کە باسـی ئادەمو حەووا دەکات، دەفـەرموێ: ﴿فَأَزَلَّهُمَا ٱلشَّيْطَٰنُ عَنْهَا فَأَخْرَجَهُمَا مِمَّا كَانَا فِيهِ ... ﴿٣٦﴾﴾ البقرة، واتە: شەیتان خلیـسکاندنی بـەهۆی ئـەو درەختـە قەدەغـە کـراوەوە، وە لـە بەهەشـت وەدەرینـان ﴿وَقُلْنَا ٱهْبِطُوا۟﴾، وە پێمان گوتن شۆڕبنەوەو دابەزن، کەواتە: ئینسـان بەهۆی گونـاهەوە دادەبـەزێو شۆڕدەبێتـەوە. ﴿...وَعَصَىٰٓ ءَادَمُ رَبَّهُۥ فَغَوَىٰ ﴿١٢١﴾﴾ طـه، واتـە: ئـادەم سەرپێـچیی لە فەرمانی پەروەردگاری کرد تووشـی ژینتـاڵیی بوو و، تووشـی سەرگەردانییو سەرلـێشێواویی بوو، بەڵام بە پێچەوانەوە بـەهۆی طـاعـەتو چاکەوە، ئینسـان بەرز دەبێتەوە، ئادەم کـە تۆبـەی کـرد، چـی لـێهـات؟ ﴿ثُمَّ ٱجْتَبَٰهُ رَبُّهُۥ فَتَابَ عَلَيْهِ وَهَدَىٰ ﴿١٢٢﴾﴾ طـه، واتە: دوایی خوا هەڵـیبژاردو تۆبـەی لێوەرگرتو ڕێنمـایی کرد، وە خوای بـە بـەزەیی لـە سـوورەتی (فـاطر)دا دەفـەرموێ: ﴿مَن كَانَ يُرِيدُ ٱلْعِزَّةَ فَلِلَّهِ ٱلْعِزَّةُ جَمِيعًا ۚ إِلَيْهِ يَصْعَدُ ٱلْكَلِمُ ٱلطَّيِّبُ وَٱلْعَمَلُ ٱلصَّٰلِحُ يَرْفَعُهُۥ ...﴿١٠﴾﴾،

واتە: هەركەسێ عیززەتی دەوێ، عیززەت هەمووی لای خوایە، وشە چاكەكان بەرەو خوا بەرزدەبنەوە، وە كردەوەی چاك بەرزی دەكاتەوە، یانی: كردەوەی چاك ئەو وشە چاكە بەرزدەكاتەوە، كەواتە: ئێمە بەهۆی طاعەتەوە بەرز دەبینەوە، وەك چۆن بەهۆی گوناهەوە شۆڕ دەبینەوە، بابە ئادەم‌و دایكە حەووا (علیهما السلام) بە هۆی گوناهێكەوە لە بەهەشت دەركرانو، ئێمەش دەبێت بەهۆی طاعەتەوە جارێكی دیكە بچینەوە نێو ئەو بەهەشتە، كە بە هۆی گوناهەوە لێی دەركراوین.

خوا بە لوتف‌و كەرەمی خۆی لەو كەسانەمان بگێڕێ، كە بەهۆی طاعەتی خواوە بەرزیی دنیاو دواڕۆژ بەدەست بێنین، وە بەهۆی پابەندیی بە شەریعەتی خواوەو، ملكەچییمان بۆ فەرمانی خوا، جارێكی دیكە شایستەی ئەوە بین كە بچینەوە نێو بەهەشتی ڕازاوەو نەبڕاوەی خوا تبارك و تعالى.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی دەیەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

لەم دەرسەماندا حەوت (٧) ئایەت لە ئایەتی (٤٠ تاکو ٤٦) لە سووڕەتی (البقرة) تەفسیر دەکەین، پێشتر باسمان کرد، کە لە ئایەتی (٤٠ تاکو ١٢٣) واتە (٨٤) ئایەت باسی جوولەکەکان دەکات، بەتایبەت، وە باسی خاوەن کتێبەکان بەگشتی و، خوای زاناو شارەزا پانتاییەکی زۆر لە سووڕەتی (البقرة) تەرخان دەکات، بۆ باسی وەچەی ئیسرائیل، وەك گوتم بە تایبەت، وە ئەهلی کیتاب بە گشتی، بۆ ئەوەی بۆ ئۆممەتی موحەممەد ﷺ ببنە سەرمەشق، هەم لە هەڵەو کەموکوورییەکانیان پەند وەربگرن و، هەم تەماشای سیفەتە باشەکانیشیان بکەن، کە دیارە لەم ئایەتانەدا بەزۆری داکۆکیی کراوە لەسەر خاڵە لاوازەکانیان، بۆ ئەوەی بۆ ئۆممەتی موحەممەد ﷺ ببنە جێگای پەندو عیبرەت، جا لەم ئایەتانەدا کە دەمانەوێ بیانتوێژینەوە، خوا ﷻ دە (١٠) فەرمان بە وەچەی ئیسرائیل دەکا، وە پێنج (٥) قەدەغەشیان ئاراستە دەکات، دوایی باسیان دەکەین.

﴿ يَٰبَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ ٱذۡكُرُواْ نِعۡمَتِيَ ٱلَّتِيٓ أَنۡعَمۡتُ عَلَيۡكُمۡ وَأَوۡفُواْ بِعَهۡدِيٓ أُوفِ بِعَهۡدِكُمۡ وَإِيَّٰيَ فَٱرۡهَبُونِ ﴿٤٠﴾ وَءَامِنُواْ بِمَآ أَنزَلۡتُ مُصَدِّقٗا لِّمَا مَعَكُمۡ وَلَا تَكُونُوٓاْ أَوَّلَ كَافِرِۭ بِهِۦۖ وَلَا تَشۡتَرُواْ بِـَٔايَٰتِي ثَمَنٗا قَلِيلٗا وَإِيَّٰيَ فَٱتَّقُونِ ﴿٤١﴾ وَلَا تَلۡبِسُواْ ٱلۡحَقَّ بِٱلۡبَٰطِلِ وَتَكۡتُمُواْ ٱلۡحَقَّ وَأَنتُمۡ تَعۡلَمُونَ ﴿٤٢﴾ وَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُواْ ٱلزَّكَوٰةَ وَٱرۡكَعُواْ مَعَ ٱلرَّٰكِعِينَ ﴿٤٣﴾ ۞ أَتَأۡمُرُونَ ٱلنَّاسَ بِٱلۡبِرِّ وَتَنسَوۡنَ أَنفُسَكُمۡ وَأَنتُمۡ تَتۡلُونَ ٱلۡكِتَٰبَۚ أَفَلَا تَعۡقِلُونَ ﴿٤٤﴾ وَٱسۡتَعِينُواْ بِٱلصَّبۡرِ وَٱلصَّلَوٰةِۚ وَإِنَّهَا لَكَبِيرَةٌ إِلَّا عَلَى ٱلۡخَٰشِعِينَ ﴿٤٥﴾ ٱلَّذِينَ يَظُنُّونَ أَنَّهُم مُّلَٰقُواْ رَبِّهِمۡ وَأَنَّهُمۡ إِلَيۡهِ رَٰجِعُونَ ﴿٤٦﴾ ﴾

## مانــای وشــە بە وشـەی ئایەتەکـان

((ئەی وەچەی ئیسرائیل، ئەو چاکانەی من لەگەڵم کردوون بەیاد بێننەوە، وە پەیمانی من جێبەجێ بکەن، تاکو منیش پەیمانی ئێوە جێبەجێ بکەم، وە تەنیا ترس و سامتان لەمن هەبێ ﴿٤٠﴾ وە بڕوا بێنن بەوەی کە ناردوومەتە خوارێ، کە ئەوەی بە ئێوەشە بە ڕاستی دەزانێ، وە یەکەمین بێ بڕوا مەبن پێی، وە بە ئایەتەکانی من نرخێکی کەم مەکڕن، وە تەنیا پارێز لەمن بکەن ﴿٤١﴾ وە ناهەق تێکەڵی هەق مەکەن و ڕاستی مەشارنەوە، لە حاڵێکدا کە دەزانن {هەق شاردنەوە چەند گوناهێکی گەورەیە} ﴿٤٢﴾ وە نوێژ بەرپا بکەن و زەکات بدەن، وە لەگەڵ ڕکووعبەراندا ڕکووع بەرن ﴿٤٣﴾ چۆن بە خەڵکی دەڵێن: چاکە بکەن خۆشتان فەرامۆش دەکەن، لە حاڵێکدا کە کتێبی (خوا)ش دەخوێننەوە، ئایا نافامن ؟ ﴿٤٤﴾ وە (بۆ دینداریی کردنتان) یارمەتی لە خۆڕاگریی و نوێژ وەرگرن، وە نوێژ بەرپاکردن شتێکی گەورەو گرانە، مەگەر لەسەر بۆخوا ملکەچان ﴿٤٥﴾ ئەوانەی کە پێیان وایە بە پەروەردگاریان دەگەن و دەگەڕێنەوە لای وی ﴿٤٦﴾)).

## شیکردنەوەی هەندێ لە وشەکان

(**يَٰبَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ**): (بني إسرائيل) دیارە وشەیەکی لێکدراوە، (بَني)، واتە کوڕانی یاخود وەچەی (إسراءيل)یش نازناو (لقب)ی (یەعقووب)ە عليه السلام، یەعقووب کە بە (یوسف) ڕا دوازدە کوڕی هەبوون، وەچەی یوسف و یازدە برایەکانی پێیان گوتراوە: (بني إسرائيل)، واتە: وەچەو کوڕانی یەعقووب (إسرائيل)یش، (إسرا) واتە: عەبد (ئیل)، واتە: (الله) بە زمانی عیبری، واتە: (عبدالله) کەواتە: (بني إسرائيل) مەبەست پێی جوولەکەکانە، بەڵام ئەوە لە مەقامی مەدحدایە، واتە: ئێوە بزانن کوڕی کێن ؟! وە نەوەی کێن ؟ نەوەی یەعقووبن عليه السلام کە پێغەمبەرێکی هەڵبژاردەی خوایە.

(وَأَوۡفُواْ): (وَفَّى بعَهْدِهِ يَفي وَفاءً وَأوفَى: إذَا تمَّمَ العَهْد وَلَمْ يَنقُض حِفظَهُ) (أوفوا) واتە: وەفا بکەن‌و جێبەجێ بکەن، چونکە (وَفَّى بعَهْدِهِ يَفي وَفاءً وَأوفَى) بە مانای پەیمانەکەی جێبەجێ کرد، جا ئەگەر پەیمانی جێبەجێ کردو تەواوی کردو هەڵێنەوەشاندەوە، دەگوترێ (وَفَّى بعَهْدِهِ).

(بِعَهۡدِيٓ): (العَهْدُ: حِفْظُ الشَّيءِ وَمُرَاعَاتُهُ حَالاً بَعدَ حَال، وَسُمِّيَ الموثِق الَّذي يَلزَمُ مُرَاعَاتُهُ عَهداً) واتە: (عَهْدْ) بریتیە لەوەی ڕەچاوی شتێك بکەی‌و ئاگات لێیبێ، وە ئەو پەیمانەی کە داکۆکیی لەسەر دەکرێ بە: (عَهْدُ) ناونراوە.

(فَٱرۡهَبُونِ): (الرَّهْبَة وَالرَّهْبُ والرَّهَبُ: مَخَافَةٌ مَعَ تَحَرُّز واضْطِراب)، واتە: (الرَّهْبَة) بریتیە لە ترسان لەگەڵ خۆ پاراستن‌و دڵەڕاوکێدا.

(تَلۡبِسُواْ): (اللَّبْسُ هو السَّترُ وَلَبِسَ الثَّوبَ، ولَبَس عَلَيهِ الأمر: خَلَطَهُ)، (لَبْس) واتە: (سَتْر): داپۆشین دەگوترێ (لَبِسَ الثَّوبَ)، واتە: بەرگەکەی پۆشی، وە دەگوترێ: (لَبَس عَلَيهِ الأَمْرَ) واتە: ئیشەکەی لێ تێکەڵ کرد، کەواتە (لَبِسَ، يَلْبَسُ) واتە: لەبەری کردو پۆشی، دەیپۆشێ، بەڵام (لَبَس، يَلْبِسُ)، واتە: تێکەڵی کرد، تێکەڵی دەکات.

(ٱلۡحَقَّ): (أصْلُ الحَقِّ: المطَابَقَةُ والموَافقَة) ئەسڵی وشەی (الحَقّ) ئەوەیە، کە شتێك موتابیقی شتێك بێت، کە لە واقیعدا لەسەریەتی.

(بِٱلۡبَٰطِلِ): (البَاطِل: نَقيضُ الحَقِّ وهو مَا لاثبات لَهُ عِندَ الفَحْص عَنهُ)، واتە: (باطل) پێچەوانەی هەقەو، شتێکە کە نەمێنێتەوەو پێچەوانەی واقیع بێت.

(بِٱلۡبِرِّ): (البِرّ: التواضُّع في فعلِ الخَيْر)، واتە: (البِرّ) بریتیە لە فراوانیی لە کاری خێرو چاکەدا.

(وَتَنسَوۡنَ): (النِّسيْان: تَرْكُ الإنسَانِ ضَبْطَ ما استودِعِ إمَّا عَن ضعف القَلْب أو

غَفلَةٍ أو عَن قَصْدٍ)، واتە: (النِّسيَان) ئەوەیە ئینسان شتێك كە پێی سپێردراوە بیپارێزێ، لەبیری بچێ، جا یان بەهۆی ئەوەوە، كە دڵی لاوازە، یان بەهۆی بێ ئاگاییەوە، یان بە ئەنقەست لەبیرخۆی بەرێتەوە.

(**بِٱلصَّبْرِ**)؛ (الصَّبر: حَبْسُ النَّفْسِ عَلَى مَا يَقتَضيهِ العَقْلُ وَالشَّرْعُ)، واتە: (الصَّبر) بریتیە لەوەی كە تۆ خۆت حەبس بكەی، لەسەر شتێك كە عەقڵ دەیخوازێو شەرع دەیخوازێ.

(**لَكَبِيرَةٌ**)؛ (كَبِيرَة)، واتە: گەورە، بەڵام لێرەدا بە مانای (شَاقَّة وصَعْبَةٌ) قورس و بەزەحمەت، هاتوە.

(**ٱلْخَٰشِعِينَ**)؛ كۆی (خاشِع)ە، (الخشُوعُ: الضَّرَاعَةُ، و يُستَعملُ الْخُشوعُ فيمَا يُوجَد عَلَى الجَوارِحِ) واتە: (الخشُوعُ) بریتیە لە ملكەچیی بۆ خواو لە خوا ترسانو لالانەوەو كڕووزانەوە، وە (خشُوعُ) زیاتر بۆ ئەو شوێنەوارە بەكاردێ، كە لەسەر ئەندامەكان دەردەكەوێ.

(**يَظُنُّونَ**)؛ (الظَّن)، واتە: گومان، بەڵام لە بەكارهێنانی قورئاندا (ظَنّ) هەم بەمانای عیلمو یەقین دێتو هەم بە مانای گومانو دوو دڵییش دێت، (راغب) دەڵێ: (الظَّن: اسمٌ لِمَا يَحْصُلُ عَن أمارَةٍ، ومَتَى قوِيَتْ أدَّتْ إلى الْعِلْمِ، ومَتَى ضعُفَتْ جِدّاً لَم يَتجَاوَزْ حَدَّ التَّوَهُّم) واتە: گومان بریتیە لەوەی كە بەهۆی نیشانەیەكەوە پەیدا دەبێت، جا ئەگەر نیشانەكە بەهێز بوو ئەوە سەردەكێشێ بۆ ئەوە كە تۆ زانستت پەیدا دەبێ، وە ئەگەر لاواز بوو، سەردەكێشێ بۆ ئەوە كە ئینسان لە شتەكەدا بەس وەهمی هەبێت، گومانو دوو دڵیی هەبێت.

(**مُّلَٰقُواْ رَبِّهِمْ**)؛ (اللّقَاءُ: مُقَابَلَةُ الشَّيءِ وَمُصَادَفَتُهُ مَعَاً) واتە: ئەوەیە كە شتێك ڕووبەڕووی شتێك بیو بیبینی، یاخود بیگەیێ، كە لێرەدا مەبەست گەیشتنە بە دیداری خوا، یاخود بینینی خوای پەروەردگارە.

## هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتەكان

لەبارەی هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ڕستە قورئانییەوە، كە خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ أَتَأْمُرُونَ ٱلنَّاسَ بِٱلْبِرِّ وَتَنسَوْنَ أَنفُسَكُمْ وَأَنتُمْ تَتْلُونَ ٱلْكِتَٰبَ ۚ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿٤٤﴾ ﴾، واتە: ئایا فەرمان بە خەڵك دەكەن چاكە بكەن‌و خۆتان لەبیردەكەن، لە حاڵێكدا كە كتێبیش دەخوێننەوە، ئایا نافامن؟ ئەم گێڕانەوانە هەن:

١) {(قَالَ إِبْنِ عَبَّاسٍ فِي رِوَايَةِ الكَلْبِي عَن أبي حَاتم بالإسناد الَّذي ذَكَرَ: نَزَلَتْ فِي يَهُود المَدِينَة كَانَ الرَّجُل مِنهُم يَقُولُ لِصِهْرِهِ وَلِذوي قَرَابَتِهِ وَلِمَن بَينَهُم وبَينَهُ رِضَاع مِنَ المُسلِمِين: أُثْبُتْ عَلَى الدين الَّذي أنتَ عَلَيهِ وَمَا يَأمرك بِهِ هَذَا الرَّجُلُ، يَعنونَ مُحَمَّداً، فإنَّ أَمرَهُ حَق فَكَانوا يَأمُرُونَ النَّاسَ بذَلِكَ وَلا يَفعَلُونَهُ) (أسبَاب النزول لِلنيسابوري، ص١٥)}، واتە: عەبدوڵڵای كوڕی عەبباس خوا لە خۆی‌و بابی ڕازی بێ، دەڵێ: لەبارەی جوولەكەكانی مەدینە هاتۆتە خوار، پیاوێكیان، بە زاوەیەكەی وە بە خزمەكانی وە بە كەسێك كە شیرییان لەنێواندا هەبووایە، دەیگوت: لەوانەی كە مسوڵمان بوون دەیانگوت: لەسەر دینەكەت دەیگوت: چونكە ئەوەی ئەو كابرایە، كە مەبەستیان موحەممەد ﷺ بوو، پێتان دەڵێ، هەقە فەرمانیان بەوان دەكرد كە لەسەر مسوڵمانەتی یان بمێننەوەو، دەیانگوت دینی موحەممەد ﷺ هەقە، كەچی بۆ خۆشیان ئیمانیان پێ نەدەهێنا.

٢) (قَتَادَة والسُدِّي وَابْنُ جَرير)یش دەڵێن: {كَانَ بَنو إسرَائيل يَأمُرُونَ النَّاسَ بِطَاعَةِ اللهِ وبِتَقْوَاه وبالبِرِّ ويُخَالِفُونَ، فَعَيَّرَهُم اللهُ ﷻ (تفسير ابن كثير، ج: (١)، ص: (١٢٦))}، واتە: وەچەی ئیسرائیل فەرمانیان بە خەڵكی دەكرد چاكە بكەن، بەڵام بۆ خۆیان چاكەیان نەدەكرد، ئیدی خوای زاڵ‌و مەزن ڕەخنەی لێگرتن.

ئەمەیان مەفهوومەكەی فراوانترە، یانی عادەتیان وابوو بە خەڵكیان دەگوت:

چاکە بکەن، وەك چۆن مەلاو شێخو ئەهلی دین، ئەوانەی شارەزا بن، هەمیشە بە خەڵکی دەڵێن چاکە بکەن، جا ئەگەر هاتو بۆ خۆیان باش پابەند نەبوون، ئەوە بێگومان ئەم ئایەتە دەیانگرێتەوە.. وەك زانایانی (أصول الفقه) گوتوویانە: (إنَّ خصُوصَ السَبَبِ لاَ يَمنَعُ شمولِ المعْنَى)، واتە: ئەوە کە هۆیەکەی تایبەتە، ڕێگر نابێ لەبەردەم گشتگیریی ماناکەیدا، کەواتە: هەرکەسێ چاکە بەخەڵکی بڵێ، بەڵام بۆخۆی نەیکات، ئەو ئایەتە دەیگرێتەوە.

## مانای گشتی ئایەتەکان

خوا ﷻ بۆ یەکەم جار لەم سوورەتەدا وەچەی ئیسرائیل دەدوێنێو دەفەرموێ: ﴿ يَٰبَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ ٱذۡكُرُواْ نِعۡمَتِيَ ٱلَّتِيٓ أَنۡعَمۡتُ عَلَيۡكُمۡ ﴾، واتە: ئەی وەچەی ئیسرائیل چاکەی من، کە من لەگەڵم کردوون وەبیرخۆتانی بێننەوە، جا چاکەی خوا ﷻ خۆ نە یەك بووە، نە دوو بووە، نە دە بووە... هتد، وەك لە دوایی دەیگەیێنێ کە خوا بە وەچەی ئیسرائیل دەفەرموێ: ﴿ ...وَأَنِّي فَضَّلۡتُكُمۡ عَلَى ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٤٧﴾ ﴾ البقرة ، وە لەڕاستیدا ئێمە میللەتێکمان پێ شك نایەت بەقەدەر وەچەی ئیسرائیل خوا چاکەی لەگەڵ کردبن، نیعمەتی پێدابن و، موعجیزەی پێ دابنو، کارئاسانیی بۆ کردبن! دیارە ئەوەش لەبەر ئەوە بووە کە لە هەلومەرجێکی زۆر سەخت دابوونو، دوژمنیان زۆر بوونو ئەگەر خوا ﷻ زۆر چاکەی لەگەڵ نەکردبانو، زۆری نیعمەت لەگەڵ بەکارنەهێنابان، وە زۆر موعجیزەی بە مووسا ﷺ نەدابان، نەیاندەتوانی ئەو بارەی کە لەسەر شانیانە جێبەجێی بکەن، پاشان دەفەرموێ ﴿ وَأَوۡفُواْ بِعَهۡدِيٓ أُوفِ بِعَهۡدِكُمۡ ﴾، واتە: وەفا بە پەیمانی من بکەنو پەیمانی من جێبەجێ بکەن، ئەو پەیمانەی لەگەڵ من بەستووتانە، کە تەنیا بەندایەتیی بۆ من بکەن، جێبەجێی بکەن، منیش ئەو پەیمانەی کە پێمداون، بۆتان جێبەجێ دەکەم، پەیمانی خوا چییە کە بە بەندەکانی داوە؟ ئەوەیە کە لە دنیادا سەریان بخاتو، ڕزقی حەڵاڵیان بۆ زۆربکاتو، لەشیان ساغ بکاتو بەختەوەریان بکاتو، لە

دواڕۆژیشدا بیانخاتە بەهەشت، ئنجا دەفەرموێ: ﴿ وَإِيَّٰيَ فَٱرۡهَبُونِ ﴾، تەنیا لەمن بترسن، ترستان لە دوژمنانتان نەبێت، وە ترستان لە لەدەستچوونی تەماع و بەرژەوەندیی نەبێت. ﴿ وَءَامِنُواْ بِمَآ أَنزَلۡتُ مُصَدِّقٗا لِّمَا مَعَكُمۡ ﴾، واتە: وە بڕوا بێنن بەوەی ناردوومەتە خوار، کە ئەوەی بە ئێوەشە بەڕاستی دەزانێ، قورئان تەوراتی مووسا بەڕاست دەزانێ، هەروەك ئینجیلی عیساو، زەبووری داوود، وە کتێبی هەموو پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) بەڕاست دەزانێ، وە دان بە پێغەمبەرایەتی هەموو پێغەمبەران دا دێنێ، وە ڕێز لە هەموو پێغەمبەران دەگرێ، وەك هەر لە سووڕەتی (البقرة)دا دەفەرموێ: ﴿ لَا نُفَرِّقُ بَيۡنَ أَحَدٖ مِّن رُّسُلِهِۦ ... ﴿٢٨٥﴾ ﴾، واتە: ئێمە جیاوازیی ناخەینە نێو هیچ یەکێك لە پێغەمبەران، یانی: لە ئەسڵی ڕێزو حورمەتو پایەی بەرزیانداو، لەوەدا کە هەموویان خوای پەروەردگار وەحی بۆ ناردوون، جیاوازیی ناخەینە نێوان پێغەمبەران، هەرچەندە لە ڕوویەکی دیکەوەو بە ئیعتیبارێکی دیکە لە پلەییان هەیەو گەورەو گەورەتریان هەیە، کەواتە: ئەوەی کە بۆ موحەممەدی کوڕی عەبدوڵلا ﷺ، بۆ پێغەمبەری کۆتایی هاتوە، ئەی وەچەی ئیسرائیل! ئەوەی کە بە ئێوەشە، بەڕاستی دەزانێو (تصدیق)ی دەکات. ئنجا دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تَكُونُوٓاْ أَوَّلَ كَافِرِۭ بِهِۦ ﴾، واتە: ئێوە یەکەمین کافر مەبنو یەکەمین کەسانێك مەبن، کە بەرانبەر بە قورئان بێبڕوا دەبن، یەکەمین کافر مەبن لە ئەهلی کیتاب، ئەگەرنا لە خەڵکی مەککە، وە لە شوێنەکانی دیکە، پێشتر کافرو هاوبەش پەیداکەر هەبوون، کە بڕوایان نەهێناوە بە موحەممەد ﷺ، بەڵام خاوەن کتێبەکان، جوولەکەکانی مەدینە، دەبوون بە یەکەمین کافرو دەبوونە ڕێ شکێن بۆ کافربوونی باقی خاوەن کتێبەکان، لە شوێنەکانی دیکە، چونکە جوولەکە هەبوون لە شام، وە لە شوێنەکانی دیکەش هەبوون، وە نەصرانیی لە شوێنەکانی دیکە هەبوون، جا ئایا چ شتێك وا دەکات کە خەڵك کوفر بە قورئان بکات، بە تایبەتی ئەهلی کیتاب؟ لەڕاستیدا بەرژەوەندییو تەماع، بۆیە دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تَشۡتَرُواْ بِـَٔايَٰتِي ثَمَنٗا قَلِيلٗا ﴾، واتە: وە بە ئایەتەکانی من

نرخێكی كەم مەكڕن، ئایەتەكانی من مەكەنە كالاّیەكو نرخێكی كەمیان پێ بكڕن! ﴿ وَإِيَّىَ فَاتَّقُونِ ﴾، وە تەنیا پارێز لەمن بكەن، دیارە جوولەكەكان ئەگەر ئیمانیان بە موحەممەد ﷺ هێنابایە كۆمەڵێك بەرژەوەندیی مادییان لەدەست دەچوو، بەتایبەت سەرانی جوولەكە، جا بەداخەوە زۆربەی میللەتان بەدوای سەرانیان دەكەون، ئەگەرنا خۆ خەڵكەكە ئەگەر چاریان هەبووایەو دەرفەتیان هەبووایە، ئەوان هیچ بەرژەوەندییەكیان ڕێی لێنەگرتبوونو، هەمیشە ئەو بەرژەوەندییانەی كە ڕێگرن، ڕێگری سەركردەو دەسەلاّتدارانن، ئەگەرنا خەڵكی دیكەی بن دەستو پێو، خەڵكی دیكەی ڕەشو ڕووت، هیچ بەرژەوەندییەك ڕێی لێنەگرتوە كە بەدوای هەق بكەوێ، بەلاّم بەداخەوە زۆربەی میللەتان بەدوای سەركردەو زلە زلەكانیان دەكەون، بۆیە خوا ﷻ لە سوورەتی (الأحزاب) دەفەرموێ: ﴿ وَقَالُوا۟ رَبَّنَآ إِنَّآ أَطَعْنَا سَادَتَنَا وَكُبَرَآءَنَا فَأَضَلُّونَا ٱلسَّبِيلَا۠ ﴿٦٧﴾ ﴾، واتە: ئەوانەی دۆزەخ (كافرەكان) گوتیان: پەروەردگارمان ئێمە بەدوای سەركردەكانو بەدوای گەورە گەورەكانمان كەوتینو، ئەوانیش لە ڕێیان لاداین، هەرچەندە ئەو عوزر هێنانەوەیە شەفاعەتیان بۆ ناكات، چونكە خوا ﷻ عەقڵو ئیرادەی بە هەموو ئینسانێك داوە، هەموو ئینسانێك دەتوانێ ئازاد بێتو دەتوانێ بە عەقڵی خۆی بەڕێدا بڕوا، وە قسەو فەرمانی هیچ كەس نەكاتە جڵەوێكو لە ملی خۆی نەكا، ئاخر ئینسان ئینسانە!! نابێت خۆی وەك ئاژەڵێك لێ بكات، كە قسەی خەڵكی دیكە بكاتە ڕێشمەیەكو ئەوسارێك بەملی خۆیدا بكات بەدوای بكەوێ، جا دوایی دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تَلْبِسُوا۟ ٱلْحَقَّ بِٱلْبَٰطِلِ وَتَكْتُمُوا۟ ٱلْحَقَّ وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴾، لێرەدا دوو شتیان لێ قەدەغە دەكاو دەفەرموێ: باتیڵ تێكەڵی هەق مەكەن، ئەو هەقەی كە ئێوە دەیزاننو لاتانە كە موحەممەد ﷺ پێغەمبەری خوایەو نیشانەكانی لە كتێبەكانی ئێوەدا هەن، ئەوە هەقەو مەچن ناهەقیی لەگەڵ تێكەڵ مەكەن، چونكە دەڵێ: جوولەكەكان دەیانگوت وەڵلاّهی ڕاستە باسی پێغەمبەری كۆتایی كراوە، بەلاّم نیشانەكانی بەسەر تۆدا نایەنەدی! دیارە بەدرۆو دوای ئەوەی كە كتێبەكەیانیان گۆڕیوە، دەڵێ ڕۆژێك پێغەمبەر ﷺ پێی

گوتن: تاکەی ئیمان ناهێنن نیشانەکانی من هەمووی لە کتێبەکانی ئێوەدا هەن، گوتیان: لە کتێبەکانی ئێمەدا دەڵێ: پێغەمبەری کۆتایی پیاوێکی زۆر باڵابەرزە، چاوی شینە، قژی زەردە، سیفەتەکانی بەسەر تۆدا نایەنە دی[1]! دیارە درۆیان دەکرد، بۆیە خوای پەروەرگار دەفەرموێ: باتڵ لەگەڵ هەق تێکەڵ مەکەن، واتە: درۆو دەلەسە مەکەنو کتێبی خوا چی فەرمووە، وای بێننە پێش، ئنجا بۆ (زانیاریتان) ئێستاش من کە (پەیمانی کۆن)م خوێندۆتەوە، کە تەوراتو کۆمەڵێك کتێبە، ئێستاش هەم لە پەیمانی کۆنداو، هەم لە (پەیمانی نوێ) کە چوار ئینجیلەکانن وێڕای کۆمەڵێك نامەو شتی دیکە، سیفەتەکانی پێغەمبەری کۆتایی هەن، کە من لەو کتێبەی کە لە (سجن)دا نووسیومە لە چەند شوێنێك دەرمهێناون، وە زانایان چەندان باسیان لەوبارەوە کردوە، دوای ئەوەش کە گۆڕیویانەو (تحریف)یشیان کردوە، ئێستاش کۆمەڵێك ئایەت هەن لە (پەیمانی کۆن) و (پەیمانی نوێ)شدا بێجگە لە پێغەمبەری خاتەم ﷺ بەسەر کەسی دیکە ناچەسپێن، جا دەفەرموێ: هەقێ مەشارنەوە لە حاڵێکدا کە دەزانن هەقە.

﴿ وَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُواْ ٱلزَّكَوٰةَ وَٱرۡكَعُواْ مَعَ ٱلرَّٰكِعِينَ ﴾، واتە: وە نوێژ بەرپا بکەنو، زەکاتی بدەن، وە لەگەڵ ڕکووعبەراندا ڕکووع بەرن، دیارە نوێژو عیبادەتی جوولەکەو نەصرانیی یەکان ڕکووعی تێدا نیەو، ڕکووع تەنیا لەو عیبادەتەدا هەیە کە لە شەریعەتی پێغەمبەری کۆتایی دایە، وە ڕەنگە لە هیوانیشدا بووبێ، بەڵام دەستکاریی (تحریف) کرابێ، بە هەرحاڵ ئێستا ڕکووع بردن لە عیبادەتیاندا نیە، بۆیە دەفەرموێ: ﴿ وَٱرۡكَعُواْ مَعَ ٱلرَّٰكِعِينَ ﴾، ڕکووع بەرن لەگەڵ ڕکووع بەراندا، یانی: لەگەڵ مسوڵمانانندا بەندایەتیی بۆ خوا بکەن، بەو ڕێیە ڕاستو دروستەدا کە پێغەمبەری خاتەم پێشانتان دەدات، کە هەمان ڕێگایە عیساو مووساو باقی پێغەمبەرانی لەسەر بوون، بەڵام ئێوە لاتانداوەو پێغەمبەر ﷺ ڕاستتان دەکاتەوە، پاشان سەرزەنشتیان دەکاتو دەفەرموێ: ﴿ أَتَأۡمُرُونَ ٱلنَّاسَ

---

١) وەك لە ئایەتەکانی دواتردا ئەم بەسەرهاتە دێنین.

بِالْبِرِّ وَتَنسَوْنَ أَنفُسَكُمْ وَأَنتُمْ تَتْلُونَ الْكِتَابَ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴾، واتە: ئایا فەرمان بە خەڵکی دەکەن چاکە بکەنو خۆتان لەبیر دەکەن، لە حاڵێکدا کە ئێوە کتێب دەخوێننەوە، ئایا نافامن؟! واتە ئەگەر کەسانێك کە کتێبی خوایان لەبەردەستدا نەبێت، عوزریان هەبێت بە نەزانین، ئێوە ئەو عوزرەشتان نیە، ئێوە کتێبی خواتان لەبەردەست دایە، لە حاڵێکدا بە خەڵکی دەڵێن چاکە بکەن، بۆچی بۆخۆشتان نایکەن، کە ئەوە دیارە وەك گوتم بە تەنیا ئەهلی کیتاب ناگرێتەوەو، هەموو ئەهلی عیلم دەگرێتەوە، بەڵکو هەموو کەسێك دەگرێتەوە کە شارەزایی هەبێتو بە خەڵك بڵێت: چاکە بکەن، دیارە پێش ئەوان دەبێت بۆخۆی چاکە بکات، پاشان فەرمانیان پێ دەکات دەفەرموێ: ﴿ وَاسْتَعِينُوا بِالصَّبْرِ وَالصَّلَاةِ وَإِنَّهَا لَكَبِيرَةٌ إِلَّا عَلَى الْخَاشِعِينَ ﴿٤٥﴾ الَّذِينَ يَظُنُّونَ أَنَّهُم مُّلَاقُو رَبِّهِمْ وَأَنَّهُمْ إِلَيْهِ رَاجِعُونَ ﴿٤٦﴾ ﴾، واتە: وە یارمەتی وەربگرن لە خۆڕاگرییو لە نوێژ، بۆ ئەوەی بتوانن بەندایەتیی بۆ خوا بکەن، وە نوێژو ئارامییش زۆر قورسو بەزەحمەتە، مەگەر لەسەر کەسانێك کە بۆ خوا ملکەچن، ئەوانیش ئەوانەن کە یەقینیان هەیە بە دیداری پەروەردگاریانو دڵنیان کە بۆ لای ئەو دەگەڕێنەوە، دیارە هەرکەسێك یەقینی هەبوو دەچێتەوە خزمەت خواو بەدیداری خوا شاد دەبێت، بە تەئکید طاعەتو عیبادەت لەسەر شانی سووك دەبێت، ئەم ئایەتە ئەو حەقیقەتە دەگەیەنێ.

## چەند مەسەلەیەکی گرنگ

**مەسەلەی یەکەم:** بۆچی خوا ﷻ پاش ئەوەی لە بیست ئایەتەکانی یەکەمدا باسی پێکهاتەی کۆمەڵگای ئیسلامیی، کرد، وە لە نۆ ئایەتی دوای ئەوان ڕووی لە بەشەرییەت کرد کە پەروەردگاری خۆتان بپەرستن، وە ئیمان بەو کتێبە بێنن، کە بۆ پێغەمبەری کۆتایی ناردوویەتی ﷺ، وە پاشان باسی بەسەرهاتی ئادەمی کرد ؛، ئنجا دوای ئەوە لە دوو تویێی هەشتا ئایەت زیاتردا، باسی وەچەی ئیسرائیل دەکات؟ چونکە لەڕاستیدا وەك پێشتریش باسمان کرد،

گەلی جوولەکە ئەزموونێکی زۆر بەربڵاوو زۆر فراوانو جۆراو جۆریان هەبووە لە دینداریی‌یدا، لە حوکمڕانیی‌یدا، لە جەنگو جیهاددا، لە فەرمانبەرییکردنی پێغەمبەرەکەیانو لە سەرپێچیی لێکردنیدا، ئەزموونێکی زۆر جۆراو جۆرو دەوڵەمەندو بەپێزو فراوانیان هەیە، کە زۆر جێگای پەندو عیبرەت وەرگرتنن، بۆ ئۆممەتی پێغەمبەری کۆتایی ﷺ کە تەماشایان بکەنو پەند لە هەڵەکانیان وەربگرنو سوود لە چاکەکانیان وەربگرن.

**مەسەلەی دووەم**: خوای پەروەردگار یەکەمین کۆمەڵێك کە بانگیان دەکات کە ئیمان بێنن، بەنی ئیسرائیلە، بۆچی؟ چونکە لەڕاستیدا ئەوان کە کتێبی خوایان لەبن دەستدایە، لە هەموو کەس شایستەترن ئیمان بێنن بە کۆتا کتێبی خواو بە پێغەمبەری کۆتایی، کە هەموو پێغەمبەرانی پێش خۆی، وە هەموو کتێبەکانی پێش خۆی، بەڕاست دەزانێ‌و بۆیە بانگیان دەکات، تاکو ئەوانە دوایی بیانوویان نەبێت بڵێن: ئێمە بانگ نەکراوین ئیمان بێنین، چونکە بۆ زانیاریتان ئێستاش هەندێ لە جوولەکەو نەصرانییەکان دەڵێن: موحەممەد ﷺ بەڵێ پێغەمبەرە، بەڵام تەنیا پێغەمبەری عەرەبانە، بەڵام لێرەدا خوا ﷻ بە ڕاشکاویی بانگیان دەکاتو دەفەرموێ: ﴿ وَءَامِنُواْ بِمَآ أَنزَلْتُ مُصَدِّقًا لِّمَا مَعَكُمْ وَلَا تَكُونُوٓاْ أَوَّلَ كَافِرِۭ بِهِۦ ﴾، ئیدی ڕێگای ئەو جۆرە عوزرو بیانووانەی نەهێشتوە.

**مەسەلەی سێیەم**: خوای بەرزو مەزن دەفەرموێ: ﴿ وَأَوْفُواْ بِعَهْدِىٓ أُوفِ بِعَهْدِكُمْ ﴾، وەفا بە پەیمانی من بکەن، منیش وەفا بە پەیمانی ئێوە دەکەم، جا ئایا وەفای بەندە (عبد) بە پەیمانی خوا چییە؟

یەکەم پەیمانی خوا ﷻ پەیمانێکی فیطریی‌و عەقڵییە کە لە هەموو کەسێکی وەرگرتوە کە بەندەی خوا بێت، وەك پێشتر باسمان کردو، ئەم ئایەتەی سوورەتی (الأعراف)یش ئاماژەی پێ دەکا، کە دەفەرموێ: ﴿ وَإِذْ

أَخَذَ رَبُّكَ مِنۢ بَنِىٓ ءَادَمَ مِن ظُهُورِهِمْ ذُرِّيَّتَهُمْ وَأَشْهَدَهُمْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ أَلَسْتُ بِرَبِّكُمْ ۖ قَالُوا۟ بَلَىٰ ۛ شَهِدْنَآ ۛ أَن تَقُولُوا۟ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ إِنَّا كُنَّا عَنْ هَٰذَا غَٰفِلِينَ ﴿١٧٢﴾ ﴾، ئەوە ئاماژەیە بەو پەیمانە فیطرییو سروشتییو عەقڵییەی كە خوا هەموو ئینسانێكی وا خوڵقاندوە، خوای خۆی بناسێو بیپەرستێ، وەك فەرمایشتەكەی پێغەمبەریش ﷺ دەفەرموێ: {(مَا مِنْ مَوْلُودٍ إِلاَّ يُولَدُ عَلَى الْفِطْرَةِ، فَأَبَوَاهُ يُهَوِّدَانِهِ وَيُنَصِّرَانِهِ وَيُمَجِّسَانِهِ) (رَوَاهُ مُسلم برقم: (٦٧٠٠)، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه}، واتە: هەموو ئینسانێك لەسەر سروشتی خواناسیی لەدایك دەبێت، بەڵام دوایی باب و دایكی دەیكەنە جوولەكە، یان دەیكەنە نەصرانیی، یان دەیكەنە مەجووسیی، ئنجا وێرای ئەم پەیمانە خوا پەیمانێكی دیكەش لە بەندەكانی وەردەگرێ لەسەر زمانی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) كە بەرنامەیان بۆ دەنێرێو وەحییان بۆ دەنێرێو پێغەمبەرانیان بۆ دەنێرێ، بانگیان دەكەن بۆ بەندایەتییكردن بۆ خوا، كە ئەوەش پەیمانێكی دیكەیە، وە وەفای خوای پەروەردگاریش بە پەیمانی بەندەكانییەوە، وەك گوتم ئەوەیە كە لێیان خۆشبێ لە دنیاداو، تووشی خێرو خۆشییان بكات، وە لە ڕۆژی دواییشدا بیانخاتە بەهەشتی خۆیەوە.

**مەسەلەی چوارەم:** وشەی خۆڕاگریی (صَبْر) لە قورئاندا زۆر بەكارهاتوە، لە سۆنگەی ئەوەوە كە لەڕاستیدا هیچ طاعەتێك بەبێ خۆڕاگری ناكرێ، وە خۆپاراستن لە هیچ گوناهێكیش بەبێ وی هەر ناكرێ، وە خۆڕاگریی لە بەرانبەر بەڵاو گرفتارییشدا، دیسان بەبێ وی هەر ناكرێ بۆیە بەڕاستیی خۆڕاگریی بناغەی دینداریی و بەندایەتییكردنە بۆ خواو مەفهوومەكەیشی زۆر فراوانە، چونكە تۆ دەبێ خۆت حەبس بكەی لە بن باری شەرعداو خۆت ڕابگری، ئنجا دەتوانی دینداریی بكەی: ئیمان بێنی هەر پێویستیت بە خۆڕاگریی (صَبْر)ە، عیبادەت بكەی هەر پێویستیت پێەتی، ئەخلاق و ڕەوشتی بەرزت بوێ هەر پێویستیت پێیەتی، جەنگو جیهاد بكەی هەر پێویستیت

پێیەتی، بۆ ماڵ بەخشین هەر پێویستیت پێیەتی، خۆ لە گوناح و خراپە بپارێزی هەر پێویستیت پێیەتی، هەرچی طاعەتە ئەنجامی بدەی و، هەرچی خراپەیە خۆتی لێ بەدوور بگری، هەمووی پێویستی بە خۆڕاگرییە.

خوا بە لوتف و کەرەمی خۆی لەو کەسانەمان بگێڕێ کە ئەهلی خۆڕاگریی (صَبْر)ن و، ئەهلی نوێژی ڕاستەقینەن.

## دە فەرمانی گەورەو پێنج قەدەغەی گرنگ

ئەگەر لە بیرتان بێ ئێمە لە پێناسەی ئەم دەرسەدا گوتمان: لە ئایەتی: (٤٠ تا ٤٦) لەو حەوت ئایەتەدا، خوای پەروەردگار دە فەرمانی بە وەچەی ئیسرائیل کردوون و پێنج شتیشی لێ قەدەغە کردوون، دە فەرمانەکان بەڕیز ئەمانەن:

**فەرمانی یەکەم**، فەرمووی: ﴿ ٱذْكُرُوا۟ نِعْمَتِىَ ٱلَّتِىٓ أَنْعَمْتُ عَلَيْكُمْ ﴾، واتە: چاکەی من یاد بکەنەوە.

**فەرمانی دووەم**، فەرمووی: ﴿ وَأَوْفُوا۟ بِعَهْدِىٓ ﴾، واتە: پەیمانی من جێبەجێ بکەن.

**فەرمانی سێیەم**، فەرمووی: ﴿ وَإِيَّٰىَ فَٱرْهَبُونِ ﴾، واتە: تەنیا لە من بترسن.

**فەرمانی چوارەم**، فەرمووی: ﴿ وَءَامِنُوا۟ بِمَآ أَنزَلْتُ مُصَدِّقًا لِّمَا مَعَكُمْ ﴾، واتە: ئیمان بێنن بەوە کە من ناردوومەتە خوارو ئەوەی بە ئێوەیە بەڕاستی دەزانێ.

**فەرمانی پێنجەم**، فەرمووی: ﴿ وَإِيَّٰىَ فَٱتَّقُونِ ﴾، واتە: تەنیا پارێز لە من بکەن.

**فەرمانی شەشەم و حەوتەم و هەشتەم**، فەرمووی: ﴿ وَأَقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُوا۟ ٱلزَّكَوٰةَ وَٱرْكَعُوا۟ مَعَ ٱلرَّٰكِعِينَ ﴾، واتە: نوێژ بەرپا بکەن و زەکات بدەن و لەگەڵ ڕکووعبەراندا ڕکووع بەرن.

**فەرمانی نۆیەم و دەیەم**، فەرمووی: ﴿ وَٱسۡتَعِينُواْ بِٱلصَّبۡرِ وَٱلصَّلَوٰةِ ﴾ پشت بە صەبرو بە نوێژ ببەستن، یاخود یارمەتی بخوازن لە خۆڕاگرییو لە نوێژ، بۆ بەجێهێنانی بەندایەتیی بۆ خوا.

**وە پێنج قەدەغەکراوەکانیش بە ڕیز ئەمانەن:**

**قەدەغەی یەکەم/** فەرمووی: ﴿ وَلَا تَكُونُوٓاْ أَوَّلَ كَافِرِۭ بِهِۦۖ ﴾، واتە: یەکەمین کەسانێك مەبن کە کوفر دەکەن بە موحەممەد ﷺو بەو کتێبەی کە بۆی نێرراوە، یانی: لە خاوەن کتێبەکان یەکەمین کافر مەبنو ڕێمەشکێنن بۆ کافربوونی سەرجەم خاوەن کتێبەکان.

**قەدەغەی دووەم/** فەرمووی: ﴿ وَلَا تَشۡتَرُواْ بِـَٔايَٰتِي ثَمَنٗا قَلِيلٗا ﴾، واتە: بە ئایەتەکانی من نرخێکی کەم مەکڕن، واتە: ئایەتەکانی من مەکەنە کاڵایەكو بە نرخێکی کەم بیانگۆڕنەوە، لەبەرانبەر بەرژەوەندییو تەماعی دنیادا.

**قەدەغەی سێیەم و چوارەم/** فەرمووی: ﴿ وَلَا تَلۡبِسُواْ ٱلۡحَقَّ بِٱلۡبَٰطِلِ وَتَكۡتُمُواْ ٱلۡحَقَّ وَأَنتُمۡ تَعۡلَمُونَ ﴾، واتە: هەقو باطڵ تێکەڵ مەکەنو، ئەو هەقەی کە پێتانە مەیشارنەوە.

**قەدەغەی پێنجەم/** فەرمووی: ﴿ أَتَأۡمُرُونَ ٱلنَّاسَ بِٱلۡبِرِّ وَتَنسَوۡنَ أَنفُسَكُمۡ ﴾، واتە: ئایا فەرمان دەکەن بە خەڵکی چاکە بکەن، بەڵام خۆتان لەبیر دەکەن! یانی ئەو کارە مەکەنو دەستی لێ هەڵگرن، ئەگەر چ بڕ عەقڵو هۆشیتان هەیە!

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی یازدەیەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان کە سەرجەم چواردە ئایەتان دەگرێتە خۆی لە ئایەتی: (٤٧ تا ٦٠)، خوای خاوەن بەزەیی و بەخششی بێسنوور، دە (١٠) لە نیعمەت و چاکە گەورەو گرانەکانی خۆی وەبیر بەنی ئیسرائیل دێنێتەوە، کە کاتی خۆی لەگەڵ پێشووەکانیاندا کردوونی، کە هەرکامێکیان شایستەی سوپاسگوزاریەکی تایبەتە بۆ خوا ﷻ، چ جای هەموویان پێکەوە، کە دیارە بەشێکی گرنگی ئەو وەفاداریی و سوپاسگوزاریی یە، لە ئیمانهێنان بە پێغەمبەری کۆتایی موحەممەد ﷺ و ئەو قورئان و پەیامە کۆتایی یەی خوادا کە بۆی هاتوە، بەرجەستە دەبێ !

﴿ يَٰبَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ ٱذۡكُرُواْ نِعۡمَتِيَ ٱلَّتِيٓ أَنۡعَمۡتُ عَلَيۡكُمۡ وَأَنِّي فَضَّلۡتُكُمۡ عَلَى ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٤٧﴾ وَٱتَّقُواْ يَوۡمٗا لَّا تَجۡزِي نَفۡسٌ عَن نَّفۡسٖ شَيۡـٔٗا وَلَا يُقۡبَلُ مِنۡهَا شَفَٰعَةٞ وَلَا يُؤۡخَذُ مِنۡهَا عَدۡلٞ وَلَا هُمۡ يُنصَرُونَ ﴿٤٨﴾ وَإِذۡ نَجَّيۡنَٰكُم مِّنۡ ءَالِ فِرۡعَوۡنَ يَسُومُونَكُمۡ سُوٓءَ ٱلۡعَذَابِ يُذَبِّحُونَ أَبۡنَآءَكُمۡ وَيَسۡتَحۡيُونَ نِسَآءَكُمۡۚ وَفِي ذَٰلِكُم بَلَآءٞ مِّن رَّبِّكُمۡ عَظِيمٞ ﴿٤٩﴾ وَإِذۡ فَرَقۡنَا بِكُمُ ٱلۡبَحۡرَ فَأَنجَيۡنَٰكُمۡ وَأَغۡرَقۡنَآ ءَالَ فِرۡعَوۡنَ وَأَنتُمۡ تَنظُرُونَ ﴿٥٠﴾ وَإِذۡ وَٰعَدۡنَا مُوسَىٰٓ أَرۡبَعِينَ لَيۡلَةٗ ثُمَّ ٱتَّخَذۡتُمُ ٱلۡعِجۡلَ مِنۢ بَعۡدِهِۦ وَأَنتُمۡ ظَٰلِمُونَ ﴿٥١﴾ ثُمَّ عَفَوۡنَا عَنكُم مِّنۢ بَعۡدِ ذَٰلِكَ لَعَلَّكُمۡ تَشۡكُرُونَ ﴿٥٢﴾ وَإِذۡ ءَاتَيۡنَا مُوسَى ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡفُرۡقَانَ لَعَلَّكُمۡ تَهۡتَدُونَ ﴿٥٣﴾ وَإِذۡ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوۡمِهِۦ يَٰقَوۡمِ إِنَّكُمۡ ظَلَمۡتُمۡ أَنفُسَكُم بِٱتِّخَاذِكُمُ ٱلۡعِجۡلَ فَتُوبُوٓاْ إِلَىٰ بَارِئِكُمۡ فَٱقۡتُلُوٓاْ أَنفُسَكُمۡ ذَٰلِكُمۡ خَيۡرٞ لَّكُمۡ عِندَ بَارِئِكُمۡ فَتَابَ عَلَيۡكُمۡۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٥٤﴾ وَإِذۡ قُلۡتُمۡ يَٰمُوسَىٰ لَن نُّؤۡمِنَ لَكَ حَتَّىٰ نَرَى

ٱللَّهَ جَهْرَةً فَأَخَذَتْكُمُ ٱلصَّٰعِقَةُ وَأَنتُمْ تَنظُرُونَ ﴿٥٥﴾ ثُمَّ بَعَثْنَٰكُم مِّنۢ بَعْدِ مَوْتِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿٥٦﴾ وَظَلَّلْنَا عَلَيْكُمُ ٱلْغَمَامَ وَأَنزَلْنَا عَلَيْكُمُ ٱلْمَنَّ وَٱلسَّلْوَىٰ ۖ كُلُوا۟ مِن طَيِّبَٰتِ مَا رَزَقْنَٰكُمْ ۖ وَمَا ظَلَمُونَا وَلَٰكِن كَانُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ ﴿٥٧﴾ وَإِذْ قُلْنَا ٱدْخُلُوا۟ هَٰذِهِ ٱلْقَرْيَةَ فَكُلُوا۟ مِنْهَا حَيْثُ شِئْتُمْ رَغَدًا وَٱدْخُلُوا۟ ٱلْبَابَ سُجَّدًا وَقُولُوا۟ حِطَّةٌ نَّغْفِرْ لَكُمْ خَطَٰيَٰكُمْ ۚ وَسَنَزِيدُ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٥٨﴾ فَبَدَّلَ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ قَوْلًا غَيْرَ ٱلَّذِى قِيلَ لَهُمْ فَأَنزَلْنَا عَلَى ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ رِجْزًا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ بِمَا كَانُوا۟ يَفْسُقُونَ ﴿٥٩﴾ وَإِذِ ٱسْتَسْقَىٰ مُوسَىٰ لِقَوْمِهِۦ فَقُلْنَا ٱضْرِب بِّعَصَاكَ ٱلْحَجَرَ ۖ فَٱنفَجَرَتْ مِنْهُ ٱثْنَتَا عَشْرَةَ عَيْنًا ۖ قَدْ عَلِمَ كُلُّ أُنَاسٍ مَّشْرَبَهُمْ ۖ كُلُوا۟ وَٱشْرَبُوا۟ مِن رِّزْقِ ٱللَّهِ وَلَا تَعْثَوْا۟ فِى ٱلْأَرْضِ مُفْسِدِينَ ﴿٦٠﴾

## مانای وشە بە وشەی ئایەتەکان

((ئەی وەچەی ئیسرائیل! یادی چاکەی من بکەنەوە کە بە سەرتانم دا ڕشتوە، وە کە من بەسەر جیهانییاندا هەڵمبژاردوون ﴿٤٧﴾ وە پارێز لە ڕۆژێك بکەن کە کەس لە فریای کەس نایەت، وە هیچ کەس تکاکردنی لێوەرناگیرێ، وە قەرەبووی لێوەرناگیرێ، وە سەریش ناخرێن﴿٤٨﴾ وە یاد بکەنەوە، کاتێك لە دارو دەستەی فیرعەون دەربازم کردن، کە بە خراپترین ئازار سزایان دەدان! کوڕەکانتانیان سەردەبڕی و ئافرەتەکانتانیان دەهێشتەوە، وە لەوەدا تاقیکردنەوەیەکی مەزنی پەروەردگارتان هەبوو بۆتان ﴿٤٩﴾ وە یاد بکەنەوە کە دەریامان بۆ لەتکردن و قوتارمان کردن، وە دارو دەستەی فیرعەونمان خنکاند، لە کاتێکدا کە ئێوە تەماشاتان دەکردن﴿٥٠﴾ وە یاد بکەنەوە کاتێك پاش چل شەو بەڵێنمان بۆ مووسا دانا، کەچی ئێوە پاش وی گوێلکتان کردە پەرستراو، وە خۆتان بە ستەمکار دەرهێنا ﴿٥١﴾ ئنجا پاش ئەوەش لێمانبوردن بەڵکو سوپاسگوزاریی بکەن ﴿٥٢﴾ وە یاد

بکەنەوە کە کتێبو جیاکەرەوە (ی هەقو ناهەق)مان بە مووسادا، تاکو ڕێی ڕاست بگرن ﴿٥٣﴾ وە یاد بکەنەوە کاتێك مووسا بە گەلەکەی خۆی گوت: ئەی گەلەکەم ! بەڕاستی ئێوە ستەمتان لە خۆتان کرد، بە گوێلك کردنە پەرستراو، دەجا بگەڕێنەوە لای بەدیهێنەرتانو خۆتان بکوژن، ئا ئەوەتان لەلای بەدیهێنەرتان چاکترە، ئیدی ئەویش تۆبەی لێوەرگرتن، بێگومان ئەو تۆبە وەرگری بەخشندەیە ﴿٥٤﴾ وە یاد بکەنەوە کاتێك گوتتان: ئەی مووسا ! بڕوات پێ ناهێنین هەتا بە ئاشکرا خوا نەبینین، ئیدی لە سزای ئەوەدا هەورە تریشقەیەك لێیدان کە تەماشاتان دەکرد ﴿٥٥﴾ پاشان دوای مردنتان زیندوومان کردنەوە بۆ ئەوەی سوپاسگوزاریی بکەن ﴿٥٦﴾ وە هەورمان بەسەرتانەوە کردە سێبەرو گەزۆو باڵندەی (سەلوا)مان بۆ ناردنە خوار (وە پێمان گوتن) لەو ڕۆزییە پاكو چاکانەی پێمان داون، بخۆن، وە ستەمیان لە ئێمە نەکرد، بەڵکو ستەمیان لە خۆیان کرد ﴿٥٧﴾ وە یاد بکەنەوە کاتێك پێمان گوتن: بچنە ئەم شارەوەو بە فراوانییو خۆشییو لە هەر کوێیەك حەزتان کرد بخۆن، وە بە چەمینەوەوە بچنە نێو دەرگاکەیەوەو بڵێن: لە گوناح پاکمان بکەوە ئەو کاتە لە هەڵەکانتان دەبوورین، وە بۆ چاکەکاران (بەرهەمو پاداشت) زیاد دەکەین ﴿٥٨﴾ کەچی ئەوانەی ستەمیان کرد، قسەکەیان گۆڕی بە جیاواز لەو قسەیەی پێیان گوترابوو، بۆیە ئازارێکمان لە ئاسمانەوە بۆ ناردنە خوار بەهۆی لادانیانەوە ﴿٥٩﴾ وە یاد بکەنەوە کاتێك مووسا داوای ئاوی بۆ گەلەکەی کرد، ئێمەش پێمان گوت: بە گۆچانەکەت لە تاشە بەردەکە بدە ئیدی یەکسەر دوازدە سەرچاوەی تێدا تەقینەوە، کە هەر کۆمەڵێك کانیو ئاوی خۆیانیان دەزانی، بخۆنو بخۆنەوە لە ڕۆزی خوا، وە خراپەکاریی لە زەویدا بڵاومەکەنەوە ﴿٦٠﴾)).

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(**أَذْكُرُواْ**): (الذِّكْرُ: تارَةً يُقالُ وَيُرادُ بِهِ هَيئة لِلنَّفسِ بِهَا يُمكِنُ لِلإِنسَانِ أن يَحفَظَ مَا يَقتنيهِ مِنَ المعرفة، وهو كالحِفظِ إلاَّ أن الحِفظَ يُقالُ اعتباراً بإحرازه، والذِّكر يُقالُ اعتباراً باستِحضارِه، وَتارةً يُقالُ لِحضُورِ الشَّيءِ القَلْبِ أو القَوْلِ) واتە: (ذِكْر) ناوە بۆ ئەو بەشەی مێشك كە زانیاری تێدا هەڵدەگیرێ، وە (ذِكْر) وەك (حِفْظ) وایە، بەڵام لە (حِفْظ)دا پاراستنی زانراوەكانو، لە (ذِكْر)دا وەبیرخۆ هێنانەوەیان ڕەچاوكراوە، وە جاری وا هەیە (ذِكْر) بەكاردێ، بۆ ئەوە كە ئینسان شتێك دێنێتەوە بیری خۆیو بە دڵی خۆیدا دێنێ، یاخود بە زمان باسی دەكات، وەك ڕاغیبی ئەسفەهانیی گوتوویەتی.

(**فَضَّلْتُكُمْ**): (الفَضْلُ: الزِّيَادَةُ عَنِ الإقتِصَادِ) واتە: (فضل) بریتیە لە زێدە لەو ئەندازەیەی كە بەش دەكات، كەواتە: (فَضَّلْتُكُمْ): هەڵمبژاردوونو زێدەییم پێداون.

(**تَجۡزِى**): (الجَزَاء: الغَنَاء والكِفَايَة) (جزاء) ئەوەیە كە شتێك ببێتە كافی بۆ شتێك، وە شتێك كەلێنی بۆ پڕ بێتەوە، یاخود بەرگریی لێبكرێ.

(**شَفَٰعَةٌ**): (الشَّفْعُ: ضَمُّ الشَّيءِ إلى مِثْلِهِ)، وشەی (الشَّفْعُ) بریتیە لەوەی كە شتێك لەگەڵ وێنەی خۆیدا كۆبكەیەوەو جووتیان بكەی، خوا دەفەرموێ: ﴿ وَٱلشَّفۡعِ وَٱلۡوَتۡرِ ۝٣ ﴾ الفجر، واتە: سوێند بە جووتو تاك (والشَّفاعَة هِيَ: الإنضِمَامُ إلى آخر ناصِراً لَهُ وسَائِلاً عَنهُ، وأكثرُمَا يُسْتَعْمَلُ في انضِمَامِ مَنْ هو أعلَى حُرْمَةً ومَرْتَبَةً إلى مَنْ هُوَ أَدْنَى) واتە: شەفاعەت (تكا بۆكردن) ئەوەیە كە یەكێك بۆ یاریدەدانو بەرگرییكردن بچێتە پاڵ یەكێك، بەڵام بەزۆریی بۆ چوونە پاڵی بابایەكی ڕێزدارترو پایە بەرزتر بۆ بابایەكی پلە

نزمتر، بەکاردێ (کە دیارە بە مەبەستی بەرگریی لێکردنو بەرژەوەندیی بۆ هێنانەدی، دەبێ).

(عَدْلٌ): (العَدالةُ والمُعَادَلَةُ: لَفظٌ يَقْتَضي مَعْنى المُسَاوَاة، و يُسْتعمَلُ باعْتِبار المُضَايَفَةِ، والعَدْلُ والعِدْلُ يَتقارَبَان، لَكِن العَدْلُ يُسْتَعْمَلُ فِيمَا يُدْرَكُ بالبَصيرَة كَالأحْكَامِ، والعِدْلُ والعديل لما يُدْرك بالحاسَّة)، واتە: هەردوو وشەی (العَدالةُ والمُعَادَلَةُ) لە یەکسانییەوە نیزیکن، وە (عَدْلُ وعِدْل) لەیەك نیزیکن، بەلاّم (عَدْل) بۆ شتی مەعنەویی بەکاردێ، کە بە عەقڵ دەزانرێ، وەك: حوکمەکان، بەلاّم (عِدْل) بۆ شتی وا کە بە هەستەکان دەرك بکرێ، بەکاردێ، وەك باری ولاّخ.

(يَسُومُونَكُمْ): (السَّوْمُ أصلُهُ: الذّهَابُ في ابتِغاءِ الشَّيءِ) واتە: (السَّوْمُ) لە بنەڕەتدا ئەوەیە کە بڕۆی بەدوای شتێك بکەوی پەیدای بکەی، بەلاّم لێرەدا بەمانای ئازارو سزا بەکارهێنراوە: ﴿يَسُومُونَكُمْ سُوٓءَ ٱلْعَذَابِ﴾، واتە: پێیان دەچێشتن عەزاب و ئازارێکی زۆر خراپ.

(بَلَآءٌ): لە قورئاندا هەم بەمانای نیعمەت بەکاردێ، هەم بەمانای نیقمەت، واتە: هەم بەمانای چاکەو هەم بە مانای خراپە، هەروەها بە مانای تاقیکردنەوەش بەکاردێ، چونکە تاقیکردنەوەش، یان بە چاکە دەبێت، یان بە خراپە، وەك دەفەرموێ: ﴿كُلُّ نَفْسٍ ذَآئِقَةُ ٱلْمَوْتِ وَنَبْلُوكُم بِٱلشَّرِّ وَٱلْخَيْرِ فِتْنَةً وَإِلَيْنَا تُرْجَعُونَ ﴿٣٥﴾﴾ الأنبياء، واتە: هەموو کەس مەرگ دەچێژێ، وە بەخۆشییانو بە ناخۆشییان تاقیتان دەکەینەوە، وە بۆ لای ئێمەش دەگەڕێنەوە، دیارە لێرەدا وشەی (بلاء) بە مانای تاقیکردنەوە دێ.

(فَرَقْنَا): (الفَرْقُ يُقارِبُ الفَلْقَ، والفِرْقُ: القِطْعَةُ المُنْفَصِلَةُ، وقيلَ فَرَقُ الصُّبْحِ، وفَلَقُ الصُّبْحِ)، واتە: (الفَرْقُ) کە بە مانای لێك جیاکردنەوەیە، لەگەڵ وشەی (الفَلْقَ) زۆر لێك نزیکن، بۆیە دەگوترێ: (فَرَقُ الصُّبْحِ، وفَلَقُ الصُّبْحِ)، واتە کاتی سپێدەی بەرەبەیان کە تاریکیی و ڕووناکیی لێك جیادەبنەوە.

**(ءَالَ فِرْعَوْنَ)**: (ءَال) لە (آلَ يَؤُلَ)ەوە هاتوە، واتە: (رَجَعَ يَرْجِعُ)، گەڕایەوە، دەگەڕێتەوە، وە (ءال فرعون: أتبَاعُهُ) ئالی فیرعەون ئەوانەن کە بەدوای دەکەون، واتە شوێنکەوتووانیو دەستو دایەرەی فیرعەونو سوپای فیرعەون.

**(تَشْكُرُونَ)**: (الشُّكْر: تَصوُّر النِّعمَة وَإظهارِهَا) یانی: (شکر) ئەوەیە، کە تۆ نیعمەت بێنیە بەرچاوی خۆتو دەریبخەی، کەواتە: شوکری نیعمەت، ئەوەیە کە ئەو نیعمەتەی پێت دراوە، یەکەم: بیهێنیە بەرچاوی خۆتو لەبیرت بێت، دوایی لە خۆشتیدا دەریبخەیو پێشانی بدەی.

**(وَٱلْفُرْقَانَ)**: (الفُرْقَان: هُوَ كَالفَرْقِ لَكِنهُ أبلَغُ مِنهُ لأنهُ يُسْتَعملُ فِي الفرق بَيْنَ الحَقِّ والبَاطِل)، واتە: (فُرْقَان) وەك (فَرْق) وایە، کە وەك گوتراوە بە مانای لێك جیاکردنەوەیە، بەلاّم (فُرْقَان) زێدەیی زیاتری تێدایە، چونکە بۆ لە یەك جیاکردنەوەی هەقو ناهەق بەکاردێ.

**(جَهْرَةً)**: (يُقَالُ لِظُهورالشَّيء بِإفرَاطِ حَاسَةِ البَصَر أو حَاسَةِ السَمع) واتە: (جَهْرَةً) بریتیە لە دەرکەوتنی شتێك زۆر بەڕوونیی، بە شێوەیەك کە زۆر چاك چاو بیبینێ، وە زۆر چاك گوێ بیبیستێ، واتە: (جَهْرَةً) هەم بۆ ڕەنگو دیمەن دەگوترێ، کە بە چاو دەبینرێ، کە زۆر ڕوونو ئاشکرا بێت، وە هەم بە دەنگێکی بەرزو زولاّل، کە بە گوێ ببیسترێ.

**(ٱلصَّٰعِقَةُ)**: (الصَّاعِقَةُ والصَّاقِعَةُ يَتقارَبَانِ، وَهُما الهَدَّةُ الكَبِيرَةُ والأولى فِي العُلْويّة والثانية فِي الأرضيَّة) واتة: (الصَّاعِقَةُ والصَّاقِعَةُ) لێك نزیکن کە بریتیە لە دەنگێکی گەورە، وەك شتێك بکەوێ، یاخود شتێك بتەقێتەوە، بەلاّم (الصَّاقِعَةُ) لەسەر زەوییەو (الصَّاعِقَةُ) پەیوەندی بە ئاسمانەوەیە، کە لە سەرێوە بۆ خوارێ بێ.

**(وَظَلَّلْنَا)**: (ظِل) واتە سێبەر وە (ظُلَّة) شتێکە کە سێبەرت لێبکا، بۆ وێنە: هەور، (ظَلَّلْنَا عَلَيْهِم) واتە: سێبەرمان لێکردن.

(ٱلْغَمَامَ): (الغَمُّ: سَتْرُ الشَّيءِ، وَمِنهُ: الغَمَامُ)، یانی: (غَم) بریتیە لە داپۆشینی شتێك، وە هەور ناونراوە: (غَمَام)، چونكە ژێر خۆی دادەپۆشێ، (غَمَام وَسَحَاب) دیارە ناوی (جنس)ن‌و تاكەكەیان (غَمَامة) و (سَحَابَة)ن، یانی: هەور.

(ٱلْمَنَّ): (مَادَةٌ صِمْغِيَة حلوة)، واتە: (مَنّ) بریتیە لە ماددیەكی لینجی شیرین، كە بە كوردی (گەزۆ)ی پێ دەڵێن.

(وَٱلسَّلْوَىٰ): (أصْلُهَا مَا يُسَلّي الإنسَان)، واتە: (سَلْوى) لە ئەسڵ هەر شتێكە كە دڵی ئینسان خۆشبكا، بەڵام لێرەدا بەتایبەتی كە لە قورئاندا بەكارهاتوە، مەبەست پێی جۆرێكە لە باڵندە لەسەر ڕای زۆربەی زانایان، كە دەڵێن: لە شێوەی كۆتردایە، هەندێك دەڵێن: سوێسكەیەو هەندێك دەڵێن: ناوی (سەمانیی)ە، كە ڕەنگە لەنێو كوردەواریی خۆماندا نەبێت، هەندێكیش دەڵێن: بە كوردی (شێلاقە)ی پێ دەڵێن، كە ڕەنگە لە هەندێك ناوچەدا وابێ.

(طَيِّبَٰتِ): (أصْلُ الطَيِّبِ: مَا تَسْتَلِذُّهُ الحَوَاسُّ، وَمَا تَسْتَلِذُّهُ النَّفسُ، وفي الشَّرْعِ: مَا كَانَ مُتَنَاوَلاً مِنْ حَيْثُ مَا يَجُوزُ) واتە: ئەسڵی (طَيِّب) هەر شتێكە كە هەستەكان چێژی لێوەرگرن، وە نەفسی ئینسان چێژی لێوەربگرێ، وە (الطَيِّب) لەڕووی شەرعەوە هەر شتێكە، كە شەرع ڕێیدابێ ئەو شتە وەربگیرێ و بەكاربهێنرێ.

(رَغَدًا): (وَاسِعاً طَيِّبَاً)، واتە: بە فراوانیی، یاخود بە خۆشیی.

(حِطَّةٌ): (حُطَّ عَنَّا ذنُوبَنَا، والحَطُّ: إنزَالُ الشَّيءِ فِي عُلو)، واتە: گوناهەكانمان لێ داباریێنەو بیانخە خوار، وە (حَطٌّ) واتە: هاتنە خواری شتێك لە بەرزایی بۆ نزمایی.

(رِجْزًا): (أصْلُ الرِّجْزِ: الإضطِرابُ)، واتە: ئەسڵی وشەی (الرِّجْز) بریتیە لە هاتن‌و چوون‌و جوڵان، بەڵام لێرەدا مەبەست پێی ئازارێكی خوای تۆڵەستێنە

کە لە ئاسمانەوە دێتو، دەبێتە هۆی ئەوە کە ئینسان نەخۆش بێتو بکەوێتە جموجوڵو فەلاکەت.

(ٱسْتَسْقَىٰ): واتە: داوای ئاوی کرد.

(فَٱنفَجَرَتْ ): (الفَجْرُ: شَقُّ الشَّيءِ شَقّاً وَاسِعَاً)، واتە: (فَجْر) بریتیە لە شتێك کە شەق بکرێو لەت بکرێو کەلێنێکی زۆری لێ پەیدا بێ.

(أُنَاسٍ ): (لُغَةٌ في النَّاس، أُنَاس جَمْع إنسي) واتە: (أُنَاس) لوغەتێکە لە (ناس) یانی: خەڵك، وە کۆی (إنسي)یە، کە بە مانای (مرۆڤ) دێ.

(مَّشْرَبَهُمْ ): (مَكَان الشُّرْبِ أو الماءُ المَشْرُوب)، واتە: شوێنی خواردنەوە، یاخود ئاوێك کە دەخورێتەوە.

(تَعْثَوْاْ ): (العَيْثُ والعَثْيُ: الفَسادُ، و (عَثِيَ) أفسَد أَشدَّ الفَسَادِ عَثى فِي الأرض)، واتە: (عَثِيَ): خراپەیەکی زۆر بڵاوکردەوە لەسەر زەوی.

## مانای گشتی ئایەتەکان

خوا ﷻ دوای ئەوەی لە ئایەتەکانی پێشوودا، دە (١٠) فەرمانی بە وەچەی ئیسرائیل کردنو، پێنج (٥) شتیشی لێ قەدەغە کردن، لەم ئایەتانەدا جارێکی دیکە بانگی وەچەی ئیسرائیل دەکاتو دەفەرموێ: ﴿ يَٰبَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ ٱذۡكُرُواْ نِعۡمَتِيَ ٱلَّتِيٓ أَنۡعَمۡتُ عَلَيۡكُمۡ وَأَنِّي فَضَّلۡتُكُمۡ عَلَى ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴾، جارێکی دیکە دووبارەی دەکاتەوەو دەفەرموێ: ئەی وەچەی ئیسرائیل! نیعمەتو چاکەی من کە بەسەرمدا ڕشتوون، یادی بکەنەوە، وە ئەوە بێننەوە بیرخۆتان کە بەسەر هەموو جیهانیاندا ئێوەم هەڵبژاردوە، هەموو توێژەرانی قورئان لەسەر ئەوە یەك دەنگن، کە مەبەست لە: (العالمين) جیهانییانی سەردەمی خۆیانە، ئەگەرنا بە دڵنیاییەوە ئۆممەتی موحەممەد ﷺ کە خوای کاربەجێ بە دەقی ئایەت لەبارەیەوە دەفەرموێ: ﴿ كُنتُمۡ خَيۡرَ أُمَّةٍ أُخۡرِجَتۡ لِلنَّاسِ تَأۡمُرُونَ بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَتَنۡهَوۡنَ عَنِ ٱلۡمُنكَرِ

وَتُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ ... ﴿١١٠﴾ ﴾ آل عمران، واتە: ئێوە باشترین ئوممەتن، باشترین کۆمەڵن کە بۆ مرۆڤایەتی پەیدا کراون، فەرمان بە شتی پەسند دەکەنو قەدەغەی شتی ناپەسند دەکەنو ئیمان بە خوا دێنن، هیچ ماقووڵ نیە جوولەکە دوای ئەوەش کە ئیمان ناهێننو بە موحەممەد ﷺ کافر دەبن، بە چاکتر دابنرێن لە ئوممەتی پێغەمبەر ﷺ!! کەواتە مەبەست پێی جیهانییانی سەردەمی خۆیانە، وە بێگومان هەموو میللەتێکی مسوڵمانو، هەموو کۆمەڵگایەکی دیندارو دەستگرتوو بە هیدایەتو بەرنامەی خواوە، لە ڕۆژگاری خۆیاندا، لە هەموو خەڵکی سەر زەوی چاکتربوونو چاکترنو، ئەوە هەر تایبەت نیە بە وەچەی ئیسرائیلەوە، بەڵکو هەموو میللەتێك کە دەستی بە بەرنامەی خواوە گرتبێو، بەدوای پێغەمبەری سەردەمی خۆی کەوتبێ، ئەوە لە هەموو خەڵکی ڕۆژگارو سەردەمی خۆی چاکتر بووە، پاشان دەفەرموێ: ﴿ وَٱتَّقُوا۟ يَوْمًا لَّا تَجْزِى نَفْسٌ عَن نَّفْسٍ شَيْـًٔا ﴾، واتە: (ئەی وەچەی ئیسرائیل) وە پارێز لە ڕۆژێك بکەن، واتە: پارێز بکەن لە کارەساتو ڕووداوەکانی کە لە ڕۆژێکدا دەقەومێن، ئەو ڕۆژە چۆنە؟ هیچ کەسێك لە فریای هیچ کەس نایەت، کە مەبەست پێی (ڕۆژی قیامەتە)، ﴿ وَلَا يُقْبَلُ مِنْهَا شَفَـٰعَةٌ وَلَا يُؤْخَذُ مِنْهَا عَدْلٌ وَلَا هُمْ يُنصَرُونَ ﴾ وە شەفاعەتو تکاو ڕەجای کەس بۆ وەرناگیرێ، وە بارمتەو قەرەبووشی لێ وەرناگیرێ، چونکە (عدل) یانی: بارمتەو فیدیەو قەرەبوو، وە سەریش ناخرێ، واتە: نە کەس لە فریای دێ، نە دەتوانرێ شەفاعەتو تکاو ڕەجای بۆ بکرێ، وە نەهیچ کەس دەتوانێ هیچ جۆرە هاوکارییەکی بکات، هەرکەسە خۆیو کردەوەکەی، کەواتە: ئەی جوولەکەکان ! ئیمان بێنن بە پێغەمبەری خاتەمو کۆتایی ﷺ، وە بەدوای شەریعەتی کۆتایی خوای پەروەردگار بکەون، بۆ ئەوەی لە ترسی ئەو ڕۆژە پارێزراوبن، کە بە تەئکید هەرکەسێك بەدوای هیدایەتی خوا نەکەوێ، لەو ڕۆژەدا تووشی جەزرەبەو سزای سەخت دەبێت، ئنجا خوا ﷻ دێتە سەر باسی وەبیرهێنانەوەی کۆمەڵێك لە نیعمەتە گەورە گەورەکانی خۆی بۆ گەلی ئیسرائیل، کە لێرەدا دە (١٠) وانەیان لێ سەرژمێر دەکات:

**نیعمەتی یەکەم:** دەفەرموێ: ﴿وَإِذْ نَجَّيْنَاكُم مِّنْ ءَالِ فِرْعَوْنَ يَسُومُونَكُمْ سُوٓءَ ٱلْعَذَابِ﴾، وشەی (إِذْ) لە قورئاندا (ئەوە وەك بنچینەیەك وەری بگرن) زانایان‌و شارەزایانی زمان دەڵێن (إِذْ) بۆ زەمانی ڕابردوو بەکاردێ، وە (مَنْصُوب)ە لەسەر (ظرفية)، بە فیعلێك کە تەقدیر دەکرێت، وەك: (اذكروا إِذْ) یادبکەنەوە کاتێك، کەواتە: (إِذْ) (منصوب)ە لەسەر (ظرفية)، چونکە هەموو (ظرف)ێك (مَنْصُوب)ەو فیعلێکی لە پێش دادەنرێت بە مەزندە، وەك: یادبکەوە، ئەوە زانایان لەسەر ئەوە یەك دەنگن، کە لە هەر شوێنێك لە قورئاندا (إِذْ) هەبوو، لە پێشەوەکەی (فعل)ێك (مُقَدَّر)ە، واتە: (فعل)ێك (تقدير) کراوە، جا لێرەدا مانای ڕستەکە ئاوایە: یادبکەنەوە کاتێك کە ئێوەمان دەرباز کرد لە فیرعەون‌و دارو دەستەکەی، لە فیرعەون‌و شوێنکەوتووەکانی، کە چییان لێ دەکردن؟ ﴿يَسُومُونَكُمْ سُوٓءَ ٱلْعَذَابِ﴾، خراپترین ئازاریان بە ئێوە دەچێشت‌و، بە خراپترین شێوە ئازاریان دەدان، پاشان خراپترین شێوە ئازاردانەکە ڕوون دەکاتەوەو دەفەرموێ: ﴿يُذَبِّحُونَ أَبْنَآءَكُمْ وَيَسْتَحْيُونَ نِسَآءَكُمْ﴾، کوڕەکانتانیان سەردەبڕی، وە ئافرەتەکانتانیان دەهێشتەوە، بێگومان قەت لەوە خراپتر نیە میللەتێك تووشی بنبڕکران (القتل العام) ببێ، بەتایبەتی ئەگەر ئەو ڕەشەکوژییە تەنیا پیاوەکان بگرێتەوەو، ئافرەتەکانیش دەمێننەوە بۆ خزمەتکاریی‌و بۆ پێ ڕابواردن‌و کارەکەریی، ئەوە خراپترین شتە کە تووشی گەلێك بێت، کە کاتی خۆی جوولەکەکان لە حاڵێکی ئاوادا بوون بەدەست فیرعەون و دەستەو دایەرەکەیەوە، ئنجا کە خوا دەربازی کردن لەنێو خۆیاندا مووسای کردە پێغەمبەر ﷺ، وە سەرەنجام لەسەر دەستی مووسا ﷺ فیرعەون‌و دەستو دایەرەکەی لەبەین چوون، وە گەلی ئیسرائیلیش دەرباز بوون، بێگومان ئەوە گەورەترین چاکەو نیعمەتە، بۆیە خوای بەخشەر لەپێش هەموویاندا باسی دەکات، پاشان دەفەرموێ: ﴿وَفِى ذَٰلِكُم بَلَآءٌ مِّن رَّبِّكُمْ عَظِيمٌ﴾، واتە: وە لە ئا ئەوەتاندا تاقیکردنەوەیەکی

مەزن هەبوو لە پەروەردگارتانەوە، تاقیکردنەوەی پێشێ بە باری ناڕەحەتیی و سەختییدا کە ئازار دەدران، دوایی بەباری خۆشییدا کە دەربازبوون.

**نیعمەتی دووەم:** دەفەرموێ: ﴿ وَإِذْ فَرَقْنَا بِكُمُ ٱلْبَحْرَ ﴾، وە یادبکەنەوە کاتێك کە دەریامان بۆ ئێوە لەت کرد، دەریامان بۆ لەت کردن، دەریای سوور کە کاتی خۆی (دەریای قولز)یان پێ گوتوە[1]، کاتێ کە سوپای فیرعەون بەدواتان کەوتن و، ئێوەش هاتن لە بەردەمتاندا دەریابووو لە پشتتانەوە سوپا بووو سەراسیمە بوون چیبکەن! بەڵام مووسا ﷺ گۆچانەکەی لە دەریادا[2]، دەریای شەق بووو پێیدا پەڕینەوە، ﴿ فَأَنجَيْنَـٰكُمْ وَأَغْرَقْنَآ ءَالَ فِرْعَوْنَ وَأَنتُمْ تَنظُرُونَ ﴾، ئنجا ئێوەمان دەرباز کردوو دەستو دایەرەی فیرعەونیشمان خنکاند لە حاڵێکدا کە ئێوە تەماشاتان دەکرد، دیارە ئەوەش نیعمەتێکی زۆر گەورەیە کە تۆ دوژمنی خۆت بە چاوی خۆت ببینی کە لەبەین دەچێ، ئەو دوژمنەی کە ساڵەهای ساڵە کوڕەکانت سەردەبڕێ و ئافرەتەکانت دەهێڵێتەوەو سۆغرە بێگارت پێ دەکا، بە چاوی خۆت ببینی کە لەبەرچاوی تۆ دەفەوتێ، نیعمەت و چاکە لەوە گەورەتر نابێت، بۆ خەڵکێکی ستەمدیدەو چەوساوە.

**نیعمەتی سێیەم:** دەفەرموێ: ﴿ وَإِذْ وَٰعَدْنَا مُوسَىٰٓ أَرْبَعِينَ لَيْلَةً ﴾، وە یادبکەنەوە کاتێك بەڵێنمان بۆ مووسا دانا دوای چل شەو، واتە: بەڵێنێکی چل شەوییمان بۆ دانا، شوێنێك کە هەندێك دەڵێن: کێوی طوور بووە، کە لە دەشتی (سینا)یە، لەسەر ئەو کێوە بێت لەگەڵ خوای بەرزو مەزندا گفتوگۆی بکات و تەوراتی لێوەربگرێ، وشەی (تەورات)یش بە زمانی عیبری واتە: شەریعەت (بەرنامە)، هەڵبەتە دوای ئەوەی وەچەی ئیسرائیل دەرباز بوون لە دەستی فیرعەون و

---

١) ڕەنگە وشەکە (قرمز) بووبێ و دوایی گۆڕابێ، (قرمز)یش بە فارسی یانی: سوور.

٢) هەندێك لە زانایان دەڵێن: مەبەست لەو دەریایە ڕووباری (نیل)ە، نەك دەریای سوور، بەڵام مادام لە سەرجەم ئایەتەکاندا هەر وشەی (بحر) بەکارهاتوە، نەك (نهر) ئەو ڕایەم پێ بێهێزە، شایانی باسە (پەیمانی کۆن)یش هەر باسی پەڕینەوە لە دەریای سووری کردوە، بڕوانە (التفسير التطبيقي للكتاب المقدّس) ص (١٦٠)، العهد القديم، سفر الخروج ، الإصحاح: ١٤، (عبور البحر الأحمر).

هاتوونەتە جەوێکی ئازادەوە، پێویستییان بە بەرنامەیەك هەبووە کە ژیانی خۆیانی پێ ڕێك بخەن، خواش بەڵێنی بە مووسادا ﷺ کە دوای چل شەو گفتوگۆی لەگەڵدا بکاتو تەوراتی پێ بدا، بەلاّم دەفەرموێ: ﴿ ثُمَّ ٱتَّخَذۡتُمُ ٱلۡعِجۡلَ مِنۢ بَعۡدِهِۦ وَأَنتُمۡ ظَٰلِمُونَ ﴾، کەچی ئێوە صەبرتان نەگرت تا مووسا دەگەڕێتەوەو تەوراتتان بۆ دێنێ، بەڵکو لە غیابی ئەودا گۆلکتان پەرستو گۆلکێکتان لە زێڕ دروستکردو پەرستتان بوونە ستەمکار، واتە: وە ئێوە ستەمتان لە خۆتان کرد ﴿ ثُمَّ عَفَوۡنَا عَنكُم مِّنۢ بَعۡدِ ذَٰلِكَ لَعَلَّكُمۡ تَشۡكُرُونَ ﴾، کەچی لەدوای ئەوەش دیسان ئێمە چاوپۆشییمان لێکردنو لێمان بوردن، بۆ ئەوەی کە سوپاسگوزاریی بکەن.

**نیعمەتی چوارەم:** دەفەرموێ: ﴿ وَإِذۡ ءَاتَيۡنَا مُوسَى ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡفُرۡقَانَ لَعَلَّكُمۡ تَهۡتَدُونَ ﴾، واتە: وە یادبکەنەوە کاتێك کتێبو جیاکەرەوە (ی هەقو ناهەق)مان بە مووسادا، کە کتێبەکە تەوراتەو جیاکەرەوەی هەقو ناهەقیش سیفەتی تەوراتە، بەلاّم خوا ﷻ بۆیە بە جیا باسیکردوە، چونکە سەرەکیترین سیفەتی کتێبەکانی خوا ئەوەیە کە هەقو ناهەق حەلاڵو حەرام، چاكو خراپ، بۆ خەڵك لەیەك جیا دەکەنەوە، وە ئەوە گەورەترین ئەرکە کە کتێبی خوا وە بەرنامەکانی خوا دەیبینن، دەفەرموێ: کتێبمان بە مووسادا وە فورقانمان پێدا، بۆ ئەوە کە ڕێگای ڕاست بگرن، واتە: بۆ ئەوەی میللەتێك بن بەو شێوە بەڕێوە بچن کە خوا پێی خۆشە، بەو شێوەیە ژیانتانو گوزەرانتان بەڕێوە ببەن، ئنجا دەفەرموێ: ﴿ وَإِذۡ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوۡمِهِۦ يَٰقَوۡمِ إِنَّكُمۡ ظَلَمۡتُمۡ أَنفُسَكُم ﴾، ئەمجار دێتە سەر باسی چۆنیەتی گەڕانەوەو تۆبەکردنیان لە گۆلك پەرستییو بەخشرانیان، کە دیارە هەروا ئاسان نەبووە، بەلکو لە سۆنگەی ئەوەوە کە گەورەترین گوناحیان کردوە، خواش گەورەترینو قورسترین تۆبەی بۆ داناون، جا خوای پەروەردگار باسی ئەوەمان بۆ دەکاتو دەفەرموێ: وە یادبکەنەوە کاتێك مووسا بە گەلەکەی خۆی گوت: ئەی گەلەکەم ئێوە ستەمتان لە خۆتان

کردوە کە گۆلکتان کردۆتە پەرستراو ﴿فَتُوبُوٓاْ إِلَىٰ بَارِئِكُمۡ﴾، دەجا بگەڕێنەوە بۆ لای بەدیهێنەرتان، لێرەدا بەدیهێنەرێتیی خوایان بیردەخاتەوە، واتە: گۆلك ئێوەی پەیدا نەکردوە تاکو بیپەرستن، چونکە: (بَرَءَ) واتە: (خَلَقَ)، وە (بارِيء) واتە: (خَالق)، واتە: ئەو کەسەی ئێوەی لە نەبوونەوە هێناوەتە بوون، بگەڕێنەوە بۆ لای وی ﴿فَٱقۡتُلُوٓاْ أَنفُسَكُمۡ﴾، خۆتان بکوژن (دوایی باس دەکەین ئەو خۆ کوشتنە چۆن بووە) ﴿ذَٰلِكُمۡ خَيۡرٞ لَّكُمۡ عِندَ بَارِئِكُمۡ﴾، ئا ئەوەتان باشترە بۆ ئێوە لای بەدیهێنەرتان، واتە: خۆتان بکوژنو پاك ببنەوە، باشترە لەوەی کە بژین بە گوناهەوەو بە چڵکی تاوانەوە، ﴿فَتَابَ عَلَيۡكُمۡ﴾، ئنجا کە ئێوە فەرمانەکانی خواتان جێبەجێ کردو خۆتان کوشت، خواش چاوپۆشیی لێکردنو تۆبەی لێوەرگرتن عەفووی کردن ﴿إِنَّهُۥ هُوَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ﴾، بێگومان خوا لێبوردەی بەخشندەو بە بەزەییە.

خوا ﷻ دوای ئەوەی لە ئایەتەکانی پێشەوەدا باسی چوار لە نیعمەتەکانی خۆی کردو خستنیەوە بیر جوولەکەکان، هەڵبەتە ئەو نیعمەتانە کە خوا دەیانخاتەوە بیریان بەوانەیان نەدراون، کە لەسەردەمی پێغەمبەردا بوون ﷺ، بەڵکو بە بابو باپیرانی ئەوان دراون، چەند هەزار ساڵ لەوەو پێش، بەڵام بۆچی خوا ئەو چاکانە بە چاوی وان دادەداتەوە؟ چونکە هەر چاکەیێ کە لەگەڵ بابو باپیرت کرابێ، مانای وایە بۆ تۆش کراوە، پاشان جوولەکەکان پشتگیریی بابو باپیرانی خۆیان دەکردو دەیانگوت: ئێمە لەسەر رێی ئەوانین وە شانازیشیان بەو نیعمەتانەوە دەکرد، جا خوای باڵادەست لێرەدا دیارە بە کورتیی دەیانفەرموێ‌و، لە سوورەتەکانی دیکەی وەك: (الأعراف) و (طه) و (الشعراء)دا، تەفصیلاتی داوەتێ، وە لە (پەیمانی کۆن)دا زۆر بە تەفصیل تر باسکراونو خودی ئەو شتانەی تێدایەو بەزیادەوەش، بەڵام وردەکاریی زیاتری تێدایە[1].

---

١) بڕوانە (التفسير التطبيقي للكتاب المقدّس) ص (١٢٦- ٢١٢)، العهد القديم، سفر الخروج، الإصحاح: (١ - ٤٠).

ئنجا یەکی دیکە لەو چاکەو نیعمەتانەیان بیردەخاتەوە:

**نیعمەتی پێنجەم:** دەفەرموێ: ﴿ وَإِذْ قُلْتُمْ يَٰمُوسَىٰ لَن نُّؤْمِنَ لَكَ حَتَّىٰ نَرَى ٱللَّهَ جَهْرَةً ﴾، واتە: وە یادبکەنەوە کاتێ گوتتان: ئەی مووسا! ئیمانت بۆ ناهێنین! (وەك ئیمانەکە بۆ مووسا بێت، بۆ خۆیان ئیمان دێنن، کەچی ئیمان هێنانەکەشیان دەکردە منەت لەسەر مووسا)، هەتا خوا بە ئاشکرا وەك ڕۆژی ڕوون نەبینین ﴿ فَأَخَذَتْكُمُ ٱلصَّٰعِقَةُ وَأَنتُمْ تَنظُرُونَ ﴾، ئیدی لە بەرانبەر ئەو بێ ئەدەبییەدا، هەورە تریشقەیەك لە ئاسمانەوە لێیدان، لەحاڵێكدا كە تەماشاتان دەكرد (یەکسەر برووسکەیەك لە ئاسمانەوە هاتو هەموویانی کوشت) ﴿ ثُمَّ بَعَثْنَٰكُم مِّنۢ بَعْدِ مَوْتِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴾، دیارە نیعمەتەکە ئا ئەوەیە: ئنجا دوای ئەو مراندنە، زیندوومان کردنەوە بۆئەوەی سوپاسگوزاریی بکەن. ئەمانە یەکەمین قەوم بوون خوا بە کۆمەڵ بیانمرێنیو زیندوویان بکاتەوە (وەك دوای باسی دەکەین)، عوزێریش تاکێك بووە، تاکە کەسێك بووە، کە خوا مراندوویەتیو زیندووی کردۆتەوە، بەڵام هاوەڵانی ئەشکەوت (أصحاب الكهف) خوا نەیمراندوونو خەواندوونی، بەڵام عوزێر سەد (١٠٠) ساڵ خوا مراندوویەتیو زیندووی کردۆتەوە، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ ... فَأَمَاتَهُ ٱللَّهُ مِاْئَةَ عَامٍ ثُمَّ بَعَثَهُۥ... ﴾ البقرة (٢٥٩)، ئەوانەش خوا مراندوونی، بەڵام دوایی زیندووی کردوونەوە، ئەوەش یەکێکە لە نیعمەتەکان، کە دوایی باسی دەکەینو هەندێ تەفسیلی هەیە.

**نیعمەتی شەشەم:** دەفەرموێ: ﴿ وَظَلَّلْنَا عَلَيْكُمُ ٱلْغَمَامَ ﴾، وە هەورمان بۆ کردنە سێبەر، سێبەرمان لێکردن بە هەور، ئەوە کەی بوو؟ لە دەشتی (سینا)دا بوو، دەشتی سیناش دەشتێکی گەرمو بیابانی قاقڕو دێمەکارە، لە (العهد القديم)دا باسی ئەو هەورە دەکات کە بۆ ڕێنیشاندانیان بووە[1]، بەڵام واپێدەچێ ئەو هەورە لەسەرکرانە سایەوسێبەرەش هەر بە داواکاریی یان

---

١) بڕوانە (التفسير التطبيقي للكتاب المقدّس)، العهد القديم، سفر الخروج ، الإصحاح: (١٣)، (عمودا السّحاب والنّار)، ص (١٥٨).

بووبێ لە مووساو گوتبیان: ئەی مووسا ! ئێمە لەم گەرمای بیابانە بێزابووینو ناحەوێینەوە، چونکە ئێمە بە ژیانی میسرەوە ڕاهاتووین، لەوێ لەسەر ڕووباری نیل لەو خۆشییو نیعمەتەدا بووین! مووساش ﷺ لە خوا پاڕابێتەوەو، خوای پەروەردگاریش هەوری بۆ کردبنە سێبەر، هەتا لە دەشتی (سینا)دا بوون، جا چەند لەوێ بوون هەمووی هەر هەوریان لەسەر سێبەر بووبێ، بۆ ئەوەی گەرمایان نەبێت.

**نیعمەتی حەوتەمو هەشتەم**، دەفەرموێ: ﴿ وَأَنزَلْنَا عَلَيْكُمُ ٱلْمَنَّ وَٱلسَّلْوَىٰ ﴾، واتە: وە بۆمان داباراندنە خواریێ گەزۆ (لەجیاتی میوە، چونکە لەو بیابانە میوە پەیدانابێ خوای بەخشەر گەزۆی بۆ ڕەخساندن لەسەر گەڵای درەختو گژوگیا، ئەوە بوو دوایی دەچوون دەیانتەکاند) وە (سەلوا)شمان لەجیاتی خۆراكو گۆشت، سەلواش جۆرێکە لە باڵندە کە وەك کەو یاخود سوێسکە وایە، دەهاتە بەردەستیانو دەیانگرتو هەرکەس بە ئەندازەی پێویستی خۆی، پاشان دەفەرموێ: ﴿ كُلُوا۟ مِن طَيِّبَٰتِ مَا رَزَقْنَٰكُمْ ﴾، لەو ڕزقو ڕۆزییە پاكو چاکانەی پێمانداون بخۆن ﴿ وَمَا ظَلَمُونَا وَلَٰكِن كَانُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ ﴾، واتە: کە سەرپێچییان کرد، ستەمیان لە ئێمە نەکرد بەڵکو زوڵمیان لە خۆیان کرد، ئینسان وەختێ کە بەندایەتیی بۆ خوا دەکات قازانجەکەی بۆ خۆیەتیو، هەم لە دنیادا بەختەوەر دەبێو ژیانێکی پاكو چاکی دەبێتو، هەم لە دوارۆژدا سەرفرازو ڕووسوور دەبێتو، بۆخۆی قازانج دەکات، وە کە گوناح دەکات بۆخۆی زەرەر دەکاتو، بۆخۆی لە دنیادا تووشی ژینتاڵیی دەبێتو تووشی دەردو نەخۆشییو عەیبدارییو گوناهبارییی دەبێ، وە لە دوارۆژیشدا تووشی سزاو ئەشکەنجەی خوا دەبێت، وەك خوای کاربەجێ لە سوورەتی (فصلت)دا دەفەرموێ: ﴿ مَّنْ عَمِلَ صَٰلِحًا فَلِنَفْسِهِۦ ۖ وَمَنْ أَسَآءَ فَعَلَيْهَا ۗ وَمَا رَبُّكَ بِظَلَّٰمٍ لِّلْعَبِيدِ ﴿٤٦﴾ ﴾، واتە: هەر کەسێ چاکە بکاتو کردەوەی باش بکاتو قازانجەکەی بۆ خۆیەتیو هەر کەسێ خراپە بکات زەرەرەکەی بۆ خۆیەتی، خوا ﷻ زۆر لەوە

بەرزترە نە ئێمە بتوانین سوودی پێ بگەیەنین، نە بتوانین زەرەری لێبدەین، بەڵکو بە چاکەو طاعەت قازانج بە خۆمان دەگەیەنین‌و، بە گوناح‌و تاوانیش زەرەر لە خۆمان دەدەین.

**نیعمەتی نۆیەم،** دەفەرموێ: ﴿ وَإِذْ قُلْنَا ٱدْخُلُواْ هَٰذِهِ ٱلْقَرْيَةَ فَكُلُواْ مِنْهَا حَيْثُ شِئْتُمْ رَغَدًا ﴾، وە یادبکەنەوە کە پێمانگوتن: بچنە ئەو شارەوە، {وشەی (قرية) لە بەکارهێنانی قورئاندا واتە شاری گەورە، مەککە شارێکی گەورە بوو لە قورئاندا پێی دەگوترێ: (أم القُرى)، بەڵام ئێستا وشەی (قرية) لە بەکارهێنانی عورفی ئێستادا، عەرەبەکان بەکاریدەهێنن بۆ گوندو لادێ، ئەو شارەش یەکێك بووە لە شارەکانی فەلەسطین}، ئنجا دەفەرموێ: ﴿ فَكُلُواْ مِنْهَا حَيْثُ شِئْتُمْ رَغَدًا ﴾، لە هەر شتێکی دەتانەوێ زۆر بەفراوانیی‌و بە خۆشیی لێی بخۆن، کە پڕە لە بەرهەم‌و پڕە لە میوەجات، ﴿ وَٱدْخُلُواْ ٱلْبَابَ سُجَّدًا ﴾، بە چەمینەوەوە لە دەرگاوە بچنە ژوورێ (سَجْدَة): لێرەدا مەبەست پێی چەمینەوەیە، ئەگەرنا ئەگەر سەرت لەسەر زەوی بێت ناتوانی بڕۆی، واتە بە چەمینەوەوەو بە ڕکووع بردنەوە، یان بە ملکەچییەوە بۆ خوا، بچنە نێو دەرگاکەوە ﴿ وَقُولُواْ حِطَّةٌ ﴾، وە داوای لێبووردنیش لە خوا بکەن: ﴿ نَّغْفِرْ لَكُمْ خَطَٰيَٰكُمْ وَسَنَزِيدُ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴾، لە گوناهەکانتان دەبووورین، وە بۆ چاکەکارانیش زیاد دەکەین، خوا ئەو نیعمەتەشی لەگەڵ کردن، بەڵام لە سەردەمی مووسادا ئەو فەرمانەیان جێبەجێ نەکرد، وەك لە سووڕەتی (المائدة)دا هاتوە: کاتێك کە مووسا پێیان دەفەرموێ: ﴿ يَٰقَوْمِ ٱدْخُلُواْ ٱلْأَرْضَ ٱلْمُقَدَّسَةَ ٱلَّتِى كَتَبَ ٱللَّهُ لَكُمْ وَلَا تَرْتَدُّواْ عَلَىٰٓ أَدْبَارِكُمْ فَتَنقَلِبُواْ خَٰسِرِينَ ﴿٢١﴾ ﴾، واتە: ئەی گەلەکەم! بچنە نێو ئەو سەرزەمینە پاکەوە کە خوا بەڵێنی پێداون، وە پاشەوپاش لەسەر پاژنەکانتان بەرەو دوا مەگەڕێنەوە، ئەگەرنا زیانبار دەبن، بەڵام ئەوان گوتیان چی؟ هەر لە سووڕەتی (المائدة)دا دەفەرموێ:

﴿ قَالُواْ يَـٰمُوسَىٰٓ إِنَّا لَن نَّدۡخُلَهَآ أَبَدٗا مَّا دَامُواْ فِيهَا فَٱذۡهَبۡ أَنتَ وَرَبُّكَ فَقَـٰتِلَآ إِنَّا هَـٰهُنَا قَـٰعِدُونَ ﴿٢٤﴾ ﴾، واتە: گوتیان: ئەی مووسا ! ئێمە هەرگیز ناچینە نێوی هەتا ئەوان لەوێدابن، دەجا تۆو پەروەردگارت بچن بجەنگن ئێمەش لێرە دانیشتووین! مووساش ﷺ فەرمووی: ﴿ رَبِّ إِنِّي لَآ أَمۡلِكُ إِلَّا نَفۡسِي وَأَخِيۖ ... ﴿٢٥﴾ ﴾ المائدة، واتە: پەروەردگارم من بەس خۆم‌و هاڕوونی برام بەدەستە، (ئەوانەش ئەوەندە بێ عەقڵن، پێیان وایە تۆ دەبێ بێی لەجیاتی ئەوان جەنگ بکەی‌و، ئیشێك کە هی خۆیانە دەیانەوێ بەتۆی بکەن! دیارە مسوڵمانی واشمان زۆرن کە شتێك دەبێ بۆخۆی بیکات، داوا لە خوا دەکات: خوایە ئەوەم بۆ بکە! خوایە ئەوەشم بۆ بکە! ... ! کاکە خۆ خوا کرێکاری تۆنیە، ئەو شتانە داوا لە خوا بکە بۆت بکات، کە بەخۆت ناکرێن، بەڵام ئەو شتانەی بەخۆت دەکرێن، هۆیەکانی بۆ سازدەو بیانکە، ئنجا دوایی کە هەموو هۆکارەکانت سازکردن، ئەوەی کە بەتۆ ناکرێن، بڵێ خوایە ئەوەم بۆ بکە! وەك پێغەمبەری ئێمە ﷺ هاوەڵانی بەڕێزی مەشق پێ دەکردو ئامۆژگاریی دەکردن‌و ڕیزی دەکردن، هەروەها بۆ خۆشی لە مەیداندا ڕاوەستاوە، ئنجا فەرموویەتی: {( اللّهم إِنْ تُهْلَكْ هذه العصابة اليوم، لا تُعبد)}[1]، واتە: ئەی خوایە ئەگەر ئەم کۆمەڵە بفەوتێن، کەس نابێ لەسەر زەوی تۆ بپەرستێ، واتە: خۆی چی پێکراوە کردوویەتی، ئنجا ئەو دووعایەی کردوە، تۆ دەبێ ئەوەی لە دەستت دێت بیکەی، ئنجا داوا لە خوای پەروەردگار بکەی، بەهەر حاڵ جا ئەوە بوو کە خوا ﷻ لەسەر ئەو هەڵوێستە بڵحەیان سزای بەنی ئیسرائیلیدا، بەچی؟ لە سوورەتی (المائدة)دا دەفەرموێ: ﴿ قَالَ فَإِنَّهَا مُحَرَّمَةٌ عَلَيۡهِمۡۛ أَرۡبَعِينَ سَنَةٗۛ ... ﴿٢٦﴾ ﴾، واتە: (خوا) فەرمووی: چل ساڵ لێیان قەدەغەیە بچنە نێو ئەو شوێنە کە وەعدمان پێداون، بۆچی؟ چونکە ئەو جیلە ترسنۆکە، ئەو

---

١) لە جەنگی بەدردا، وەك لە (السيرة النبوية)، لإبن هشام، دا هاتوە، بڕوانە، ج ٢ ، ص (٣٤)، ط ١، ٢٠٠٦، دار الهديم.

جیله كه لەنێو نازو نیعمەتی میسردا گەورە بوونو لەژێر نیری فیرعەوندا گەورە بوون، ئەوانە بەكەڵكی جیهادو بەرهەڵستییو بەرگرییو ژیانی فیداكاریی نایەن، با ئەوانە ببڕێنەوەو وەچەیەك كە لەوان پەیدا دەبێتو لە جەوێكی ئازاددا پێدەگەن، ئەوانە بەكەڵكی ئەوە دێنو ئەوانە شایستەی ئەوەن، كە خوای كاربەجێ ئەو سەرزەمینەیان پێبدا، بەهەر حاڵ ئەوەش نیعمەتێك بوو، كە دوایی خوا ﷻ بۆی هێناونەدی، بۆیە لێرە باسی دەكات، چونكە چل ساڵ دوای ئەوە، بە سەركردایەتی (یوشەعی كوڕی نوون)، وەچەی ئیسرائیل دوای ئەوە كە مووسا ﷺ وەفاتی كردو هاروونی براشی وەفاتی كرد، ئنجا چوون (شار)ەكەی فەلەستینیان گرت!

پاشان دەفەرموێ: ﴿ فَبَدَّلَ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ قَوْلًا غَيْرَ ٱلَّذِى قِيلَ لَهُمْ فَأَنزَلْنَا عَلَى ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ رِجْزًا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ بِمَا كَانُوا۟ يَفْسُقُونَ ﴾، كاتێ كە خوا فەرمووی ئاوا بچنە نێو دەرگاكەوە بە چەمینەوەو ئەو وشەیەش بڵێن: (خوایە گوناهەكانمان لێ دابارێنە) ئەوان، ئەوانەی ستەمیان لە خۆیان كرد، قسەكەیان گۆڕی بە غەیری ئەو قسەیەی كە پێیان گوترابوو، وەك دوایی باسی دەكەین، بۆیە خوا دەفەرموێ: بۆ سەر ئەوانەی كە ستەمكاربوون، سزایەكمان لە ئاسمانێوە بۆ ناردن، بەهۆی لادانیانەوە.

**نیعمەتی دەیەمو كۆتایی**، كە دەفەرموێ: ﴿ وَإِذِ ٱسْتَسْقَىٰ مُوسَىٰ لِقَوْمِهِۦ فَقُلْنَا ٱضْرِب بِّعَصَاكَ ٱلْحَجَرَ ﴾، وە یادبكەوە، كاتێك مووسا داوای ئاوی كرد بۆ گەلەكەی {دوای ئەوەی لەو بیابانەی (سینا)}دا زۆریان تینوو بووو شپرزە بوون، چوون بۆ لای مووساو گوتیان: تەگبیرێكمان لێبكە! ئنجا وەك لە (پەیمانی كۆن)[1]دا هاتوە دەڵێ: هەموو جارێش دەیانگوت: بریا نەهاتباین،

---

١) بڕوانە (التفسير التطبيقي للكتاب المقدّس)، العهد القديم، سفر الخروج ، الإصحاح: (١٣)، ص (١٥٩)، وە الإصحاح: (١٥)، ص (١٦٣)، والإصحاح: (١٦)، ص (١٦٣-١٦٤)، كە دەڵێ: (وهناك في الصحراء تذمَّر بنو إسرائيل على موسى و هارون، وقالوا لهما: ليت الربَّ أماتنا في أرض مصر فهناك كُنا نَجلِسُ حول قدرو اللّحم نأكلُ خُبْزاً حتى الشَّبَع).

بریا هەر لەوێ باین باشتر بوو، لە تینووان خنکاین! وە کە برسییان دەبوو، دەیانگوت: بریا نەهاتباین‌و هەر لەوێ باین‌و فیرعەون چەوساندباینەوە باشتربوو، لێرە لە برسان دەمرین! دیارە مووساش ﷺ زۆر لەسەر دڵی قورس بووو دەپاڕایەوە لە خوای میهرەبان، جا دەفەرموێ کاتێ مووسا داوای ئاوی کرد بۆ گەلەکەی) پێمانگوت: بە گۆچانەکەت لەو تاشە بەردە بدە ( دیارە تاشە بەردێکی گەورەی زانراوی لێبووە) ﴿ فَٱنفَجَرَتۡ مِنۡهُ ٱثۡنَتَا عَشۡرَةَ عَيۡنٗا ﴾، ئیدی یەکسەر دوازدە سەرچاوەی لێ هەڵقوڵین، ﴿ قَدۡ عَلِمَ كُلُّ أُنَاسٖ مَّشۡرَبَهُمۡ ﴾، وە هەر تیرەیە سەرچاوەی خۆیانیان دەزانی، دیارە بەنی ئیسرائیل دوازدە تیرە بوون‌و هەر تیرەیە سەرچاوەی خۆی هەبووە، تاکو لەسەر ئاو تووشی کێشەو تێکگیران نەیەن، ﴿ كُلُواْ وَٱشۡرَبُواْ مِن رِّزۡقِ ٱللَّهِ وَلَا تَعۡثَوۡاْ فِي ٱلۡأَرۡضِ مُفۡسِدِينَ ﴾، واتە: (پێمانگوتن) بخۆن‌و بخۆنەوە لە ڕزق‌و ڕۆزیی خوا، وە خراپەکاریی لە زەویدا بڵاومەکەنەوە.

## چەند مەسەلەیەکی گرنگ

**مەسەلەی یەکەم:** نیعمەتی ئازادیی‌و ڕزگاربوون لە ژێردەستەیی گەورەترین نیعمەتە، چونکە بەبێ ئەو نیعمەتە نیعمەتەکانی دیکە هیچیان بەکەڵك نایەن، کەسێك کە سەروەت‌و سامانی هەیە، یان زەوی‌و زاری هەیە، یان خزم‌و خەڵکی هەیە، ئەگەر ئازاد نەبێت‌و ژێردەستەو کۆیلە بێت، لە هیچ کام لەو نیعمەتانە بەهرەمەند نابێ بۆیە خوا ﷻ یەکەمین نیعمەت کە وەبیر جوولەکەکانی دێنێتەوە، ئەوەیە کە ئازادی کردوون‌و لە ژێر نیری فیرعەون دەریهێناون، ئنجا بە تەئکید بۆ هەموو میللەتێکی دیکەش هەروایەو، بۆ هەموو تاکێکیش هەروایەو، ئازادیی گەورەترین نیعمەتە کە خوا بە بەندەکانی خۆی داوە، وە لە ڕاستیدا بۆیە طاغووت‌و فیرعەونەکان دژی خوان‌و خراپترین کەسن، چونکە بەندەکانی خوا لەو نیعمەتی ئازادییە بێبەش دەکەن، دەیانچەوسێننەوەو

زوڵمیان لێ دەکەن و دەیانخەنە ژێر ڕکێفی خۆیانەوە، ئەو نیعمەتە کە خوا بە هەموو ئینسانێکی داوە، وەك (عومەری کوڕی خەتتاب) خوا لێی ڕازی بێ بە عەمری کوڕی عاص و، وە بە کوڕەکەی گوت، دوای ئەوەی لە کابرای (قیبطي) دابوو: (مَتى استعبَدتم النّاس وَقَدْ وَلَدَتْهُم أُمَّهَاتُهم أحرارًا)، واتە: لە کەیەوە خەڵکتان کردوە بە کۆیلە، کاتێك بە ئازادیی لە دایك بوون؟! هەموو ئینسانێك بە ئازادی لە دایك دەبێت و کەس لە ئەسڵدا کۆیلە نیە، بەڵام دوایی فیرعەون و طاغووت و نەمروودەکان دێن، خەڵك دەکەنە کۆیلە.

**مەسەلەی دووەم:** کە خوا باسی نیعمەتی پەڕینەوەی جوولەکەکان دەکات لە دەریای سوور، لە سووڕەتی (الشعراء) ئایەتی (٦٠ تا ٦٣)دا، ئەوە ڕوون دەکاتەوە، دیارە پێشێ باسی ئەوە دەکات کە فیرعەون چۆن دارو دەستەو سوپاو لەشکری خۆی هەموو کۆکردۆتەوە، دوایی دەفەرموێ: ﴿ فَأَتْبَعُوهُم مُّشْرِقِينَ ﴿٦٠﴾ ﴾ الشعراء، واتە: کاتی دەمەو ڕۆژهەڵات بەدوایان کەوتن، وەچەی ئیسرائیل پێشی بەرەبەیان و کاتی سەحەر، بە فەرمانی مووسا میسریان بە جێهێشت بەرەو دەریای سوور، هەڵبەتە بەرەو شام هاتن بەڵام دەریای سوور دیارە ڕێگریان بووە، جا پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ فَلَمَّا تَرَٰٓءَا ٱلْجَمْعَانِ قَالَ أَصْحَٰبُ مُوسَىٰٓ إِنَّا لَمُدْرَكُونَ ﴿٦١﴾ ﴾ الشعراء، واتە: کاتێ دوو کۆمەڵەکە لێك وەدەرکەوتن، هاوەڵەکانی مووسا گوتیان: بێگومان ئێمە دەگیرێین! جا لە هەندێك لە کتێبەکانی مێژوودا، وە لە تەوراتدا باس دەکا، کە سوپای فیرعەون (٦٠٠) شەشسەد مەرکەبە بوون و وەچەی ئیسرائیلیس بەس پیاوەکانیان (٦٠٠,٠٠٠) شەشسەد هەزار کەس بوون[1]، بەڵام پێم وایە ئەم ژمارانە زۆریان پێوە نراوەو، دیارە هەر لە گۆترەش گوتراون، جا کاتێك سوپاکەی فیرعەون گەلی

---

١) بڕوانە: سەرچاوەی پێشوو، العهد القديم، سفر الخروج، الإصحاح: (١٤)، ص (١٥٩)، وە الإصحاح: (١٢)، ص (١٥٦)، کە دەڵێ: (وترتحل بنو إسرائيل من رَعْمسيس الى سكّوت فكانوا نحو ستّة مائةِ ألف من الرجال المُشاة ماعدا النساء والأولاد)!

ڕاکردووی جوولەکە لێك وەدەرکەوتن، هاوەڵانی مووسا گوتیان: ئێستا پێمان دەگەن، ﴿ قَالَ كَلَّآ ... ﴾، ئەویش فەرمووی: نەخێر ﴿ ... إِنَّ مَعِىَ رَبِّى سَيَهْدِينِ ﴾ پەروەردگارم لەگەڵم دایە، ڕێم پیشاندەدا چیبکەین؟ ﴿ فَأَوْحَيْنَآ إِلَىٰ مُوسَىٰٓ أَنِ ٱضْرِب بِّعَصَاكَ ٱلْبَحْرَ ۖ فَٱنفَلَقَ فَكَانَ كُلُّ فِرْقٍ كَٱلطَّوْدِ ٱلْعَظِيمِ ﴿٦٣﴾ ﴾الشعراء، واتە: وەحییمان بۆ مووسا کردو پێمان ڕاگەیاند بە گۆچانەکەت لە دەریا بدە، لێیدا شەق بوو، دوازدە ڕێگای لێ پەیدا بوون، کە ئەملاولای هەر کام لەو ڕێیانە وەك چیایەکی مەزن وا بوو، جا لەبەر ئەوەی بەنی ئیسرائیل دوازدە تیرە بوون، هەر تیرەی لە کوڕێکی یەعقووب ﷺ پەیدابوو بوون، بۆ ئەوەی هەرتیرەیە بە یەکێك لەو ڕێگاو دالانانەدا بڕوا، بۆیە هەمووی بووبە دالان دالان، وەك لە سوورەتی (طه)دا دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ أَوْحَيْنَآ إِلَىٰ مُوسَىٰٓ أَنْ أَسْرِ بِعِبَادِى فَٱضْرِبْ لَهُمْ طَرِيقًا فِى ٱلْبَحْرِ يَبَسًا لَّا تَخَٰفُ دَرَكًا وَلَا تَخْشَىٰ ﴿٧٧﴾ ﴾، واتە: وە بێگومان بە مووسامان ڕاگەیاند، کە شەوڕۆ بە بەندەکانم بکەو، بە گۆچانەکەت لە دەریا بدەو ڕێیەکی وشکانییان بۆ بشکێنە، هیچ ترسی پێڕاگەیشتنی ئەوانت نەبێو مەترسیی (خنکانو گرفتو کێشەی دیکە)شت نەبێ، مێژووزانان دەڵێن: ڕێیەکە هێندە وشك بوو، کە تەختی بنیشی وشك بوو، وە پێیان تەڕ نەبووە، ئنجا بۆ ئەوەی لە یەکەوە دیاربن، چونکە ئەو دەریایە زۆر قووڵ بووە، خوای گەورە وای لە دەریاکە کردوە، کە لەنێوان دالانەکاندا کونو درزی وای تێدابن، کە وەك پەنجەرە یەکدی لێوە ببینن، ئنجا کاتێك دوایین نەفەری وەچەی ئیسرائیل لە دەریادا دەرچوو، کۆمەڵی فیرعەونیش کە هاتن وایانزانی ئەو دەریایە هەروا شەق بووە، هەتا هێندێك دەڵێن: فیرعەون گوتی: ئەوە هەر بۆخۆم شەقم کردوەو بەدوایان بکەون ! ئنجا کە دوایین نەفەری فیرعەون هاتە نێو دەریاو، دوایین نەفەری بەنی ئیسرائیل لێی دەرچوو، دەریا وێککەوتەوەو فیرعەونو فیرعەونییەکان خنکان، لە هەندێك تەفسیراندا دەڵێ: بەڵام هەندێك لە جوولەکەکان دەیانگوت ئێستا لە بن

بەحریّ ڕا بۆمان دیّن! ئنجا مووسا دووعای کرد: خوایە پیّشانیان بدە، ئیدی تەرمەکانیان بە فەرمانی خوا وەك ماسی سەرئاو کەوتن، بۆ ئەوەی بیانبینن، وایان ترساندبوون، وایاندەزانی لە بن بەحریّشدا هەر بۆیان دیّن، سەیرە! کە بەشەر ترسی ڕیّنیشت بیرۆکەو خەیاڵی سەیرۆکەی بۆ پەیدا دەبن!

**مەسەلەی سێیەم:** ئەو بەڵیّنەی کە خوا بە مووسایدا، سەرەتا سی (٣٠) شەو بوو، بەڵام دوایی دە (١٠) شەوی دیکەی خرایە سەرو بوو بە چل شەو، وەك لە سووڕەتی (الأعراف)دا دەفەرمویّ: ﴿ وَوَٰعَدۡنَا مُوسَىٰ ثَلَٰثِينَ لَيۡلَةٗ وَأَتۡمَمۡنَٰهَا بِعَشۡرٖ فَتَمَّ مِيقَٰتُ رَبِّهِۦٓ أَرۡبَعِينَ لَيۡلَةٗۚ ... ﴿١٤٢﴾ ﴾، جا هەندیّك لە تەفسیرەکان دەڵیّن: ئەو سی (٣٠) شەوە، سی (٣٠) شەوی ڕەمەزان بووەو، خوای پەروەردگار بە مووسای فەرمووە: تیّیاندا بەڕۆژووبەو، دوای سی (٣٠) ڕۆژەکە ئنجا گفتوگۆم لەگەڵدا بکەو تەوراتت پیّ دەدەم، دەڵیّن: مووسا دوای سی (٣٠) ڕۆژەکە سیواکی کردوە بۆ ئەوەی تامی زاری خۆش بیّت، خوای پەنهانزانیش فەرمووی: بۆچی سیواکت کرد، خۆ بۆنی زاری ڕۆژووەوان لای من زۆر خۆشە؟ دەبیّ دە ڕۆژی دیکە لە (شەووال) بەڕۆژووبی، ئیدی بوو بە چل (٤٠) ڕۆژو، دوای چل (٤٠) ڕۆژەکە ئنجا چوو تەوراتی وەرگرت.

**مەسەلەی چوارەم:** گوێلك پەرستییەکە خوا ﷻ لە سووڕەتی (الأعراف)داو لە سووڕەتی (طـه)دا باسی دەکات، دیارە ئەوەی وای لە وەچەی ئیسرائیل کرد، ئەو گوێلکە بپەرستن (سامیریی) بوو، کە لەو زیّڕو خشڵەی هەڵیانگرتبوو گوێلکیّکی بۆ دروستکردن، کونیّکی لەلای سەری کردو، کونیّکی لەلای پشتی کرد، کە با لەویّوە دەهاتو لە زاری دەردەچوو دەنگیّکی لیّدەهات وەك بارەی گوێلكو بارەی مانگا، وە گوتی: ئەوە پەرستراوی ئیّوەیەو مووسا لیّی ونبووەو لیّیدەگەڕیّ! ئاوا هەڵی خەڵەتاندن، کە دیارە کابرایەکی ساختەچی بووە، وەك خوای تاكو تەنیا لە سووڕەتی (الأعراف)دا دەفەرموی: ﴿ وَٱتَّخَذَ قَوۡمُ مُوسَىٰ مِنۢ بَعۡدِهِۦ مِنۡ حُلِيِّهِمۡ عِجۡلٗا جَسَدٗا لَّهُۥ خُوَارٌۚ ... ﴿١٤٨﴾ ﴾، واتە: وە گەلی مووسا لە

دوای وی، لەو خشڵو زێڕەی پێیان بوو، گوێلکێکیان دروستکرد کە بارەی وەك هی گوێلك بوو، وە لە سوورەتی (طـه)دا دەفەرمویٚ: ﴿ ...فَكَذَٰلِكَ أَلْقَى ٱلسَّامِرِيُّ ﴿٨٧﴾ فَأَخْرَجَ لَهُمْ عِجْلًا جَسَدًا لَّهُۥ خُوَارٌ فَقَالُوا۟ هَٰذَآ إِلَٰهُكُمْ وَإِلَٰهُ مُوسَىٰ فَنَسِىَ ﴿٨٨﴾ ﴾، واتە: ئنجا ئاوا سامیریی[1] و هەموو ئەوانەی دیکەش ئەو خشڵەی پێیان بوو خستیانە چاڵێکەوە، (کە سامیریی لە شێوەی قاڵبی گوێلك دروستی کردوە، وە زێڕو خشڵەکەی لەوێدا قاڵ کردەوەو) لە شێوەی گوێلکدا پەیکەرێکی بۆ دروستکردن، کە بۆڕەی هەبوو، گوتیان: ئەوە پەرستراوتانەو مووسا پەرستراوی خۆی لەبیرچووە.

**مەسەلەی پێنجەم:** خۆ کوشتنەکەیان زانایان بەچەند شێوەیەك باسیان کردوە، هەندێکیان دەڵێن: خوا فەرمانی کرد ئەوانەیان کە گوێلکیان نەپەرستوە، ئەوانە بکوژن کە گوێلکیان پەرستوە، وە هەندێکیان دەڵێن: خوا فەرمانی پێکردن بکەونە نێو یەك لە شەوێکی تاریکدا یەکتر بکوژن، چونکە ئەوانەش کە گوێلکیان نەپەرستوە بێ هەڵوێست بوون، وە هەندێکی دیکە لە زانایان دەڵێن: خوا فەرمانی کرد تاوانبارەکان لەنێو خۆیاندا یەکتر بکوژن، بەلام هیچ کامیان بەڵگەیەکی وایان لەسەر نیە، واش پێدەچێت خوا ﷻ فەرمانی کردبێ، ئەوانەی کە گوێلکیان نەپەرستوە، ئەوانە بکوژن کە گوێلکیان پەرستوە، وە لە هەندێك لە تەفسیرەکاندا هاتوە، کە حەفتا هەزار (٧٠٠٠٠) کەسیان لە یەکدی کوشت، ئنجا خوا ﷻ تۆبەی لێ وەرگرتن، بەلام بێگومان ئەو ژمارەیە زۆر زۆرەو لە ڕاسیی بە دووری دەزانم، بەتایبەت بۆ ئەو ڕۆژگارە کە بەشەر هێندە زۆر نەبووە.

---

١) بەلام لە تەوراتدا دەڵێ- واتە: تەوراتی ئێستا کە گۆڕراوە- ئەوەی گوێلکەکەی لە خشڵ دروستکرد، هاروونی برای مووسا بوو، علیهم السلام!! بڕوانە: سەرچاوەی پێشوو، العهد القديم، سفر الخروج، الإصحاح: (٣٢)، ص (١٩٤)، (هارون يصنع عجل الذهب)، ئەوەیە ڕێزو حورمەتی جوولەکە بۆ پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام)!

**مەسەلەی شەشەم:** خوا ﷻ لە ئایەتی ژمارە (٥٥)دا دەفەرموێ: ﴿ وَإِذْ قُلْتُمْ يَٰمُوسَىٰ لَن نُّؤْمِنَ لَكَ حَتَّىٰ نَرَى ٱللَّهَ جَهْرَةً ﴾، واتە: گەلی مووسا داوایان کردوە کە خوا ببینن، ئەگەرنا ئیمان ناهێنن تا خوا بەڕوونیی و بە ئاشکرایی نەبینن لە سووڕەتی (الأعراف)دا خوا ﷻ ئەو بەسەرهاتەمان بۆ باس دەکاتو دەفەرموێ: ﴿ وَٱخْتَارَ مُوسَىٰ قَوْمَهُۥ سَبْعِينَ رَجُلًا لِّمِيقَٰتِنَا ۖ فَلَمَّآ أَخَذَتْهُمُ ٱلرَّجْفَةُ قَالَ رَبِّ لَوْ شِئْتَ أَهْلَكْتَهُم مِّن قَبْلُ وَإِيَّٰىَ ۖ أَتُهْلِكُنَا بِمَا فَعَلَ ٱلسُّفَهَآءُ مِنَّآ ۖ إِنْ هِىَ إِلَّا فِتْنَتُكَ تُضِلُّ بِهَا مَن تَشَآءُ وَتَهْدِى مَن تَشَآءُ ۖ أَنتَ وَلِيُّنَا فَٱغْفِرْ لَنَا وَٱرْحَمْنَا ۖ وَأَنتَ خَيْرُ ٱلْغَٰفِرِينَ ﴿١٥٥﴾ ﴾، پوختەی ئەو ڕووداوە ئەوە بوو، کە ژمارەیەکی زۆر لە گەلی مووسا هاتنە لایو گوتیان: ئەی مووسا ! تۆ دەڵێی من تەوراتم لە خوا وەرگرتوەو بەین بەین دەچم گفتوگۆ لەگەڵ خوادا دەکەم، کێ دەڵێ وایە!؟ (دوای ئەو هەمووە موعجیزانەش کە بینیویانن)، مووساش گوتی: جا دەڵێن چی؟ گوتیان: دەبێ ئێمەش بێین قسە لەگەڵ خوا بکەین، گوتی: ئاخر ئەوە ناگونجێو ناکرێ، گوتیان: باشە با بێین بزانین چۆن قسە لەگەڵ خوادا دەکەی، ئێمەش دەبێ چاومان لێبێ، گوتی: باشە، ئنجا داوای لە خوای پەروەردگار کرد، خواش ﷻ فەرمووی: بە ڕیش سپییەکانیان بڵێ با حەفتا کەس ئامادەبن، ئەویش حەفتا کەسی لێ هەڵبژاردنو بوونە نوێنەرو ڕیش سپییان، دیارە مووسا ﷺ کە دەچوە سەر کێوی طوور، کە زۆربەی زانایان دەڵێن: لەسەر ئەو کێوە گفتوگۆی لەگەڵ خوای بەرزو مەزندا دەکرد، هەورێك یان تەمومژێك دایدەپۆشی، ئنجا گفتوگۆی لەگەڵ خوادا دەکرد، ئیدی هەورێك هات دایپۆشیو ئەویش گفتوگۆی لەگەڵ خوادا ﷻ کردو ئەوانیش ئەو دیمەنەیان بینی، بەڵام دوایی وەتەماع کەوتنو گوتیان: ئەی مووسا ! بەوەندە ناوەستینو دەبێ حەتمەن خوامان پێشان بدەی، هەتا خوای پەروەردگار نەبینین ئیمانی پێ ناهێنین ! مووساش ﷺ زۆر تووڕەبووو گوتی خوایە ! ئەوە بۆخۆت ئاگات لێیە چی دەڵێن! خواش ﷻ سزای دانو برووسکە (صاعِقة)یەك لە ئاسمانەوە هات

لـێیدانو هـەموویانی کوشـت ! وەك دەفـەرموێ: ﴿ وَٱخۡتَارَ مُوسَىٰ قَوۡمَهُۥ سَبۡعِينَ رَجُلٗا لِّمِيقَٰتِنَا ... ﴿١٥٥﴾ ﴾ الأعراف، واتە: وە مووسا لە گەلەکەی خۆی حەفتا پیاوی هەڵبژارد بۆ ئەو بەڵێنگەی ئێمە (کە بێن بۆئەوەی ئاگایان لێبێ داخۆ چۆن مووسا گفتوگۆ لەگەڵ خوای بێ وێنەدا دەکات) ﴿ ... فَلَمَّآ أَخَذَتۡهُمُ ٱلرَّجۡفَةُ ... ﴾، جا کاتێك ئەو لەرزینەوەیە گرتنی (دیارە برووسکەکە بۆتە هۆی لەرزینی شوێنەکەیان)، جا کاتێك مووسا ئەوەی بینی: ﴿ ... قَالَ رَبِّ لَوۡ شِئۡتَ أَهۡلَكۡتَهُم مِّن قَبۡلُ وَإِيَّٰيَ ... ﴾، واتە: گوتی: پەروەردگارم ! ئەگەر حەزت کردبا منیشو ئەوانیشت لە پێشدا دەکوشت (یانی: ئەوانە زۆر سەرپێچیی دیکەشیان هەبووە، بۆیە منیشت بەوانەوە دەکوشت) ﴿ ...أَتُهۡلِكُنَا بِمَا فَعَلَ ٱلسُّفَهَآءُ مِنَّآ ... ﴾، جا ئایا بەهۆی ئەوەوە کە نەفامەکانمان دەیکەن، دەمانفەوتێنی؟ ئیدی خوا ﷻ زیندوویکردنەوەو لەگەڵ خۆی بردنەوەو گوتیان: جارێکی دیکە داوای وا ناکەین (وەك یەکێك بە یەکێك دەڵێ: مردنی بە چاوی خۆی بینی !!).

**مەسەلەی حەوتەم:** ئەوە کە خوا ﷻ هەوری بۆ کردوونە سێبەرو گەزۆی بۆ باراندوون، وە ئەو باڵندەیەی بۆ دەستەمۆ کردوونو هاتوونەتە بەردەستیان، ئەوە لە دەشتی (سینا)دا بووە، چونکە دەشتی سینا زۆر گەرمە، بیابانە، نە رووباری لێوە تێپەڕبووەو نە هیچ خواردنو خۆراکێکی لێبووە، بەڵام خوای بەخشەر، ئەگەر بیەوێ شتێك بۆ بەندەی خۆی بکات، ئەگەر لە بیابانێکی قاقڕو دێمەکاریش بێ، پەکی ناخات، تەماشا بکەنو پەند وەربگرن ! خوا ﷻ ئەگەر پشتی عەبدی خۆی گرت، بەحری بۆ لەت دەکات، بیابانی بۆ دەکاتە سێبەر، لە بیابانی وشك گەزۆی بۆ پەیدا دەکات، باڵندەی بۆ پەیدا دەکات، کانیاو و سەرچاوەی بۆ هەڵدەقوڵێنێ !

**مەسەلەی هەشتەم:** لەبارەی ئەو شارەوە، کە خوا فەرمانی بە مووسا کرد کە خۆیو گەلەکەی بچنە نێوی، بەڵام بە قسەیان نەکرد، پێغەمبەر ﷺ لە

فەرمایشتێکی تیشکی خستۆتە سەرو فەرموویەتی: {(قِيلَ لِبَنِي إِسْرَائِيلَ: ﴿...وَٱدْخُلُواْ ٱلْبَابَ سُجَّدًا وَقُولُواْ حِطَّةٌ نَّغْفِرْ لَكُمْ خَطَٰيَٰكُمْ ...﴿٥٨﴾﴾ البقـرة، فَدَخَلُوا، يَزْحَفُونَ عَلَى أَسْتَاهِهِمْ وَبَدَّلُوا حِطَّةً، وَقَالُوا: حَبَّةٌ فِي شَعَرَةٍ) (رَوَاهُ الْبُخَارِيُّ بِرقم: (٣٤٠٣)، وَمُسْلِم بِرقم: (٧٤٣٩)، عَنْ أَبِي هُرَيرَةَ رضي الله عنه}، واتە: بە وەچەی ئیسرائیل گوترا: بە کڕنووش بردنەوە (بە چەمینەوەوە) بچنە نێو دەرگاکەوەو بڵێن: (حِطَّةٌ) (خوایە گوناهەکانمان لێ دابارێنە)، بەڵام ئەوان قسەکەشیان گۆڕی‌و هەڵوێستەکەشیان گۆڕی، وەك فەرموویەتی: بە خشکەخشك چوون لەجیاتی بە چەمینەوەوە بچن‌و، لەجیاتی بڵێن (حِطَّةٌ) گوتیان: (حَبَّةٌ فِي شَعَرَةٍ) دەنکە گەنمێ لە موویێکدا وەك گاڵتە پێکردنێکی مووسا عليه السلام.

**مەسەلەی نۆیەم:** ئەو ئازارەی کە لە ئاسمانەوە دابەزی ﴿رِجۡزًا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ﴾، نەخۆشییەکی کوشندە بووەو، لە فەرمایشتێکدا پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم تیشکی خستۆتە سەرو لەبارەیەوە فەرموویەتی: {(إِنَّ هَذَا الْوَجَعَ رِجْزٌ أَوْ عَذَابٌ أَوْ بَقِيَّةُ عَذَابٍ عُذِّبَ بِهِ أُنَاسٌ مِنْ قَبْلِكُمْ) (رَوَاهُ مُسْلِم بِرقم: (٥٧٤٠)، عَنْ أُسَامَةَ بْنِ زَيدٍ رضي الله عنه}، واتە: بێگومان ئەم طاعوونە نەخۆشییەکە، یان پاشماوەی سزایەکە خەڵکێکی پێش ئێوە پێی سزا دراون، کەواتە: مەبەست لە (رِجْزًا) نەخۆشیی طاعوونە کە دوای ئەوەی وەچەی ئیسرائیل سەرپێچییان کردو فەرمانی پێغەمبەر مووسایان شکاند، خوا نەخۆشیی طاعوونی لەنێودا بڵاوکردنەوەو هەندێك دەڵێن: حەفتا هەزار (٧٠٠٠٠)یان فەوتا، جا ئەگەر ئەم ژمارەیە موبالەغەشی تێدا بێت، دیارە هەر ژمارەیەکی زۆریان لێ فەوتاون.

**مەسەلەی دەیەم:** دوازدە سەرچاوەکەی ئاو کە لە دەشت‌و بیابانی (سینا)دا لە تاتە بەردێك پەیدابوون، بۆیە دوازدە بوون، چونکە جوولەکەکان دوازدە بەرەباب بوون‌و، پێشتریش باسمان کرد، کە (ئیسرائیل) نازناوی (یعقوب)ە عليه السلام، کە دوازدە کوڕی بوو ون (یوسف) و (بنیامین) دووانیان بوون‌و، دە (١٠)ی

دیکەش، یوسف و بنیامین لە دایکێك بوونو، دەیەکەی دیکەش لە دایکێك، ئنجا هەرکام لەو کوڕانە تیرەیەکی لێکەوتوّتەوەو هەموویان دوازدە تیرەیان لێ وەپاشکەوتوون، وەك خوا ﷻ دەفەرمویّ: ﴿وَقَطَّعْنَٰهُمُ ٱثْنَتَىْ عَشْرَةَ أَسْبَاطًا أُمَمًاۚ وَأَوْحَيْنَآ إِلَىٰ مُوسَىٰٓ إِذِ ٱسْتَسْقَىٰهُ قَوْمُهُۥٓ أَنِ ٱضْرِب بِّعَصَاكَ ٱلْحَجَرَۖ فَٱنۢبَجَسَتْ مِنْهُ ٱثْنَتَا عَشْرَةَ عَيْنًاۖ قَدْ عَلِمَ كُلُّ أُنَاسٍ مَّشْرَبَهُمْۚ ﴿١٦٠﴾﴾ الأعراف، واتە: وەبەش بەشمان کردنو، کردنمانن بە دوازدە تیرە، هەر تیرەی کۆمەڵێك بوون، وە وەحییمان بۆ مووسا نارد کاتێك داوای ئاوی بۆ گەلەکەی کرد، کە بە گۆچانەکەت لە بەردەکە بدە! یەکسەر دوازدە سەرچاوەی لێ هەڵقوڵین، کە هەر کۆمەڵە سەرچاوەی خۆیانیان زانی[1]...

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.



١) بڕوانە: سەرچاوەی پێشوو، کە ئەویش باسی ئەم مەسەلەیەی کردوە: العهد القديم، سفر الخروج، الإصحاح: (١٧)، ص (١٦٧)، (ماءٌ من الصخرة).

# دەرسی دوازدەیەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان دوو ئایەت دەگرێتە خۆی، لە سووڕەتی (البقرة)، ئایەتەکانی ژمارە: (٦١و٦٢)، لەم دوو ئایەتانەدا خوا ﷻ لە ئایەتی یەکەمیان هەڵوێستێکی زۆر خراپی جوولەکەکان باس دەکات، کە بریتیە لە نازونوزکردنیان بەسەر مووسادا ﷺ دەربارەی خواردنو خۆراك، کە داوای خواردنو خۆراکی جۆراوجۆریان لێکردووەو پێیانگوتوە، کە ئێمە لەسەر یەك جۆرە خواردن خۆڕاناگرینو تەحەممول ناکەین، وە لە ئایەتی دووەمیاندا {واتە: ئایەتی (٦٢)دا} خوای زاناو توانا باسی حەقیقەتێکی زۆر گەورە دەکات، دەربارەی هەموو ئەوانەی کە لەژێر ناوونیشانی جیاجیاداو بەدرێژایی مێژوو بەندایەتییان بۆ خوای پەروەردگار کردوە، وە تەرازوویەك دەخاتە ڕوو بۆ هەڵسەنگاندنی هەموو ئەو کەسانەی، کە خۆیان بە بەندەی خوا لە قەڵەم داوەو دەدەن.

﴿ وَإِذْ قُلْتُمْ يَـٰمُوسَىٰ لَن نَّصْبِرَ عَلَىٰ طَعَامٍ وَٰحِدٍ فَٱدْعُ لَنَا رَبَّكَ يُخْرِجْ لَنَا مِمَّا تُنۢبِتُ ٱلْأَرْضُ مِنۢ بَقْلِهَا وَقِثَّآئِهَا وَفُومِهَا وَعَدَسِهَا وَبَصَلِهَا ۖ قَالَ أَتَسْتَبْدِلُونَ ٱلَّذِى هُوَ أَدْنَىٰ بِٱلَّذِى هُوَ خَيْرٌ ۚ ٱهْبِطُوا۟ مِصْرًا فَإِنَّ لَكُم مَّا سَأَلْتُمْ ۗ وَضُرِبَتْ عَلَيْهِمُ ٱلذِّلَّةُ وَٱلْمَسْكَنَةُ وَبَآءُو بِغَضَبٍ مِّنَ ٱللَّهِ ۗ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ كَانُوا۟ يَكْفُرُونَ بِـَٔايَـٰتِ ٱللَّهِ وَيَقْتُلُونَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ بِغَيْرِ ٱلْحَقِّ ۗ ذَٰلِكَ بِمَا عَصَوا۟ وَّكَانُوا۟ يَعْتَدُونَ ﴿٦١﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَٱلَّذِينَ هَادُوا۟ وَٱلنَّصَـٰرَىٰ وَٱلصَّـٰبِـِٔينَ مَنْ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْـَٔاخِرِ وَعَمِلَ صَـٰلِحًا فَلَهُمْ أَجْرُهُمْ عِندَ رَبِّهِمْ وَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿٦٢﴾ ﴾

## مانـای وشـە بە وشـەی ئایەتەکـان

((وە یاد بکەنەوە کاتێ گوتتان: (واتە: پێشینانتان گوتیان) ئەی مووسا ! چیدی یەك جۆرە خۆراك تەحەممول ناکەین، جا داوامان بۆ لە پەروەردگارت بکە، کە لەوەی زەوی دەیڕوێنێ، لە سەوزەکەی و ترۆزییەکەی و گەنمەکەی و نیسکەکەی و پیوازەکەی، بۆمان بڕەخسێنێ، گوتی: ئایا ئەوەی نزمترە هەڵدەبژێرن بەسەر ئەوەدا کە چاکترە؟! دەشۆڕێنەوە شارێك، تاکو ئەوەی داواتان کرد چنگتان بکەوێت، وە زەبوونیی و نەداریی یان لەسەر دانراو، تووڕەیی خوایان پێ بڕا، ئەویش لە سۆنگەی ئەوەوە کە بێبڕوا بوون بە ئایەتەکانی خوا وە پێغەمبەرانیان بە ناهەق دەکوشت، ئەویش بەهۆی ئەوەوە کە سەرپێچییان کردو دەستدرێژیی یان دەکرد ﴿٦١﴾ بێگومان ئەوانەی ئیمانیان هێناوەو ئەوانەی جوولەکەو نەصرانیی و صابیئەن، هەر کامێکیان ئیمانی بە خواو بە ڕۆژی دوایی بێنێ و کردەوەی چاك بکات، ئەوە پاداشتیان لەلای پەروەردگاریان هەیەو، نەترسیان لە سەرەو نەپەژارەش دادەگرن ﴿٦٢﴾ )).

## شیکردنەوەی هەندێك لە وشەکان

(بَقْلِهَا): (البَقْل: الخَضرَوَات ومَا لاَسَاقَ لَها مِنَ الزَّرعِ)، واتە: (بَقْلْ) بریتیە لە هەر ڕووەکێك کە قەدی نەبێت لەسەری بوەستێ و کەواتە (باقلاء) کە ئێمە بە کوردی پێی دەڵێین: (پاقلە)، ئەوە جیایەو (بَقْل) هەر شتێکە کە زەوی سەوزی دەکات مادام زۆر بەرز نەبێت و قەدی نەبێ پێی، وەك کەوەرو کەرەوزو ئەو شتانە.

(وَقِثَّآئِهَا): (ترۆزیی)، هەندێکیش بە (هاروێ)، (خەیار)یان لێکداوەتەوە، بەڵام زیاتر مانای ترۆزیی دەگەیەنێ.

(وَفُومِهَا): (فُوم) واتە: سیر (ثوم)، بەڵام زۆربەیان بە گەنم (حِنطَة)یان لێکداوەتەوە.

(وَعَدَسِهَا ): (عَدَس)، واته: نیسك.

(وَبَصَلِهَا ): (بَصَل)، واته: پیواز، پیاز.

(أَتَسْتَبْدِلُونَ ): واته ئایا دەگۆڕنەوە، چونکە دەڵێ: (الإبدَال وَالتبدِيلُ والتبَدُّلُ والإستِبدَال: جَعَلُ شَيءٍ مَكَان آخَرَ وهو أعَمُّ مِنَ العِوَضِ فإِنَّ العِوَضَ هِيَ أن يصير لَكَ الثاني و بإعطاءِ الأول والتبدُّلُ هو التغييرُ مطلقاً) وشەی (الإبدَال وَالتبدِيلُ والتبَدُّلُ والإستِبدَال) هەر چواریان ئەوەیە، کە شتێك لە شوێنی شتێك دابنێی، وە ئەوە گشتی ترە لە: قەرەبووی شتێك ئەویش ئەوەیە، کە تۆ شتێکی یەکەم بدەیو، شتێکی دووەمت بێتەدەست، بەڵام (تَبَدُّل) ئەوەیە کە بە موتڵەقیی شتێك بگۆڕی.

(ٱلذِّلَّةُ ): (الذُّلُّ: مَاكَانَ عَنِ قهرٍ)، واته: (ذلُّ) بریتیە لە ژێردەستەییەك، کە بە هۆی دەسەڵات بەسەر ڕانانەوە پەیدابووبێ.

(وَٱلْمَسْكَنَةُ ): (السُّكُونُ: ثُبوتُ الشَّيءِ بَعْدَ تحَرُّكٍ)، (سكُون) بریتیە لە وەستانی شتێك دوای ئەوەی، کە جووڵانەوەی هەبووە، (المسْكِينُ: قِيلَ هُوَ مَا لاَ شَيءَ لَهُ)، (مِسْكِين)، نەدار: هەندێك دەڵێن: ئەوەیە کە هیچی نەبێو هەندێك دەڵێن: ئەوەندەی نەبێ پێی بژیێ، کەواتە: (فَقِير) هەژار زێدەڕۆیی زیاتری تێدایە، هەندێکیش دەڵێن: بە پێچەوانەوە (فَقِير) ئەوەیە شتێکی هەبێ، بەڵام بەشی نەکا بۆ ژیانیو، (مِسْكِين) ئەوەیە هیچی نەبێت.

## هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتەکان

هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو ئایەتەی، کە دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَٱلَّذِينَ هَادُوا۟ وَٱلنَّصَٰرَىٰ وَٱلصَّٰبِـِٔينَ مَنْ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ وَعَمِلَ صَٰلِحًا فَلَهُمْ أَجْرُهُمْ عِندَ رَبِّهِمْ وَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿٦٢﴾﴾، {(عَن سلمَان رضي الله عنه قَالَ: سَأَلْتُ النَّبِيّ ﷺ عَن أَهْلِ دِينٍ كُنْتُ مَعَهُم، فَذَكَرْتُ مِن صَلاَتِهِم و عِبَادَاتِهِم، فَنَزَلَت:

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَٱلَّذِينَ هَادُواْ ... ﴾) (أَخْرَجَهُ ابْنُ أَبِي حَاتِم، وَالوَاحِدي عَن مُجاهِد وَابْنُ جَرِير وَابْنُ أَبِي حَاتِم عَن السُّدِّي بنَحوِ مَا سَبَقت، وَالشَوكَاني في (فَتح القَدِير)، ج (١)، ص (١٣٤)، وَالنيسابوري في أسباب النزول، ص (١٦)}، واته: سەلمانی فارسیی (کە هاوەڵێکی بەڕێزو گەورەی پێغەمبەرەو تەمەنێکی زۆر درێژی هەبووەو پێش ئەوەی مسوڵمان بێت، زۆر دینی تاقی کردوونەوە، وە چۆتە لای زۆر لە خوا پەرستان) دەڵێ: بۆ پێغەمبەری خوا باسی شوێنکەوتووانی ئایینێکم کرد، کە خۆشم لەگەڵیان بووم‌و نوێژو خواپەرستییان هەبوو، پرسیارم لێکرد: ئایا ئەوانە حوکمیان چۆنە؟! خوای پەروەردگار ئەم ئایەتەی نارده خوار: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَٱلَّذِينَ هَادُواْ ... ﴾.

## مانای گشتی ئایەتەکان

ئێمە لە تەفسیری بیستویەك ئایەتی ڕابردوودا، لە ئایەتی چل (٤٠)ەوە تا شەستو یەك (٦١)، کە دەکاتە بیستویەك ئایەت، لە تەفسیری حەوت ئایەتی پێشوویاندا خستمانە ڕوو کە ﷻ (١٠) فەرمانی ئاڕاستەی جوولەکەکان کرد، وە (٥) شتیشی لێ قەدەغە کردوون، ئنجا دوای ئەوە خوا ﷻ لە دوو توێی (١٦) ئایەتدا، لە ئایەتی (٤٧ تا ٦١) دە (١٠) دانە لە نیعمەتە گەورە گەورەکانی خۆی خستەوە بیریان، کە دیارە فەرمانەکان‌و قەدەغەکان ئاڕاستەی جوولەکەکان کراون، ئەوانەی کە هاوچەرخی پێغەمبەر بوون ﷺ، هەروەها چاکەو نیعمەتەکانیش خراونەوە بیر ئەوان، ئەگەرنا نیعمەتەکان کاتی خۆی لەگەڵ پێشینانی ئەواندا کراون، بەڵام چاکەو نیعمەتێك لەگەڵ باب‌و باپیران‌و پێشینانێکدا دەکرێ، کە تۆ شانازییان پێوە دەکەی، وەك ئەوەیە لەگەڵ تۆدا کرابێ، ئنجا خوا ﷻ لەم ئایەتەوە دێتە سەر باسی خستنەڕووی کۆمەڵێك ڕەخنەو کەموکووڕیی لە جوولەکەکاندا، کە مایەی سەرزەنشت‌و مایەی سەرکۆنەکردنیانن، جا یەکێك لەوانە ئەوەیە کە دەفەرموێ: ﴿ وَإِذۡ قُلۡتُمۡ يَٰمُوسَىٰ لَن نَّصۡبِرَ عَلَىٰ طَعَامٖ وَٰحِدٖ ﴾، وە یاد بکەنەوە کاتێ

کە بە مووساتان گوت (واتە: باب و باپیرانتان بە مووسایان گوت): ئەی مووسا! چیدی تەحەممولی یەك جۆرە خواردن ناکەین، یەك جۆرە خواردنەکەش مەبەستیان پێی گەزۆو سەلوا بوو، ﴿ فَٱدۡعُ لَنَا رَبَّكَ يُخۡرِجۡ لَنَا مِمَّا تُنۢبِتُ ٱلۡأَرۡضُ مِنۢ بَقۡلِهَا وَقِثَّآئِهَا وَفُومِهَا وَعَدَسِهَا وَبَصَلِهَا ﴾، جا لە پەروەردگارت بپاڕێوە بۆمان دەربێنێ لەوەی کە زەوی دەیڕوێنێ: تروزیی، خەیار، گەنم، (یاخود: سیر)، نیسك، پیواز، پێنج جۆرە شتیان باسکردوە، کە هەموویان لە زەوی دەڕوێن و، دانەوێڵەو سەوزەو میوەو تەڕەن! مووساش ﷺ لەسەر ئەو داوایەیان سەرزەنشتیان دەکات، خوای کاربەجێ لەسەر زمانی ئەو دەفەرموێ: ﴿ قَالَ أَتَسۡتَبۡدِلُونَ ٱلَّذِي هُوَ أَدۡنَىٰ بِٱلَّذِي هُوَ خَيۡرٌۚ ﴾، واتە: گوتی: ئایا خواردنێك کە خراپترە دەیهێننە شوێن یەکێك کە چاکترە، یانی: چۆن چاکتر بە خراپتر دەگۆڕنەوە، عاقڵ چۆن شتی وا دەکات؟! دیارە وەك دوایی لە (چەند مەسەلەیەکی گرنگ)دا زیاتر تیشکی دەخەینە سەر مەبەستی مووسا ﷺ وا پێدەچێ ئەوە نەبووبێ، کە لە ڕووی هێزی خۆراکیی (القوة الغذائیة)ەوە، ئەوانەی باسیان کردوون، خراپتر بن لەو خواردنانەی کە لەسەری بوون، کە بریتی بوون لە گەزۆو سەلوا، بەڵکو لەڕووی مەعنەوییەوە ئەو خواردنە سادەیەی کە دەیخۆن و کە دوو جۆرە، خواردنی کەسانێکە کە بەدوای ئازادییدا دەگەڕێن، خواردنی میللەتێکە کە دەیەوێ ژیانی ئازادانەی دەست بکەوێ و، چیدیکە ژێردەستە نەبێت و نەچەوسێنرێتەوە، هەڵبەتە میللەتێك بیەوێ نەچەوسێنرێتەوە دەبێت بە ژیانی سادە ڕازی بێت، کەواتە لەڕووی مەعنەوییەوە ئەو خواردنانەی داوایان کردوون، خراپتر بوون لەوەی کە خواردوویانەو خوای بە بەزەیی بۆی ڕەخساندوون، بۆیە وەڵامێکی زۆر پڕ بە پێستیانی داوەتەوەو فەرموویەتی: ﴿ ٱهۡبِطُواْ مِصۡرٗا فَإِنَّ لَكُم مَّا سَأَلۡتُمۡۗ ﴾، شۆڕبنەوە بۆ هەر شارێك، ئەوەی دەتانەوێ و داوای دەکەن دەستتان دەکەوێ، بچنە هەر شارێك لە شاران مادام ئێوە دەربەستی ئەوە نەبن داخۆ ئازادن یان کۆیلە، سەربەستن یان ژێردەست، مادام دەربەستی ئەوەنەبن و،

بەدوای خۆراکی جۆراوجۆردا بگەڕێن، ئەوە بچنە هەر شارێك ئەوەتان دەستدەکەوێ! بەڵام لەم بیابانە کە شوێنی خەڵکێکی ئازادە، کە ڕازی نەبن لەژێر دەسەڵاتی فیرعەونێکدا بژین، خواردنی سادە نەبێت دەستناکەوێت، ئنجا خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَضُرِبَتْ عَلَيْهِمُ ٱلذِّلَّةُ وَٱلْمَسْكَنَةُ وَبَآءُو بِغَضَبٍ مِّنَ ٱللَّهِ ﴾، سێ شت دەربارەی جوولەکەکان باس دەکات، دەفەرموێ: لە ئەنجامی ئەو هەڵوێستەو هاو وێنەی ئەم هەڵوێستەیاندا، کە بریتیە لە نازونوزکردنو بڕو بیانووگرتن داوای خۆراکی جۆراوجۆرکردنو، داوای خۆشگوزەرانیی کردن، وەك مووسا عليه السلام خاوەن چێشتخانە (مَطْعَم)بێو دەعوەتی کردبن! ئاخر مووسا عليه السلام هاتوە ئێوەی دەرباز کردوەو ڕزگاری کردوون، وە ئینسان دەبێ باجی ژیانی ئازادیی بداو تەحەممولی نارەحەتیی بکاو، تەحەممولی ژیانی سادە بکاتو، کەسێك بەدوای حۆشگوزەرانییدا وێڵ بێ، ناتوانێ ژیانێکی ئازادانە هەڵبژێرێ، بۆیە دەفەرموێ: لە ئەنجامی ئەوەدا زەبوونییان لەسەر پێویست کرا، هەروەها نەداریی (جوولەکە هەرچەندە دەوڵەمەندیش بن، بەڵام هەر نەدارو ڕووتو ڕەجاڵ دێنە بەرچاو) وە تووڕەیی خواشیان پێ برا، چونکە: (بآءوا) یانی: (رَجَعوا): گەڕاینەوە، واتە: وەك چۆن کەسێك دەچێتە سەفەرو شتێك لەگەڵ خۆی دێنێتەوە، ئەوانیش لە ئەنجامی ئەو جۆرە هەڵوێستانەیاندا تووڕەیی خوایان بردەوە، وەك دەفەرموێ: ﴿ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ كَانُوا۟ يَكْفُرُونَ بِـَٔايَـٰتِ ٱللَّهِ وَيَقْتُلُونَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ بِغَيْرِ ٱلْحَقِّ ﴾، ئەوەش لە ئەنجامی ئەوەدا کە بێبڕوابوون بەرانبەر بە ئایەتەکانی خوا، وە پێغەمبەرانی خوایان بە ناهەق دەکوشت، جا دیارە پێغەمبەرانی خوا هەر بە ناهەق دەکوژرێنو هیچ پێغەمبەرێك شتێکی واناکات کە هەق بێ بکوژرێ، بەڵام بۆیە وشەی (بِغَيْرِ ٱلْحَقِّ)ی زیاد کردوە، وەك ڕەوانبێژان دەڵێن، بۆ ئەوەی درێویی‌و ناشیرنیی‌و ناقۆڵایی ئەو تاوان‌و خراپەیان بخاتەڕوو، کە دیارە مەبەست لە پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) بە پلەی یەکەم زەکەرییاو یەحیای کوڕنیی بوون، کە جوولەکەکان کوشتیانن، وە بۆ

خۆیان لە (پەیمانی كۆن)[1]دا باسی ژمارەیەكی دی لە پێغەمبەران دەكەن، كە كوشتوویانن ﴿ ذَٰلِكَ بِمَا عَصَوا وَّكَانُوا يَعْتَدُونَ ﴾، بۆچی كوفریان بە ئایەتەكانی خوا دەكرد؟ وە بۆچی دەستیان چووە خوێنی پێغەمبەرەكانەوە؟! دیارە ئەوەش ڕیشەی هەیەو بەهۆی ئەوەوە بوو، كە سەرپێچییان لە فەرمانی خوا دەكردو ملكەچ نەبوون بۆ خوا، وە بڕوایان بە ئایەتەكانی خوا نەدەكردو، بە هۆی ئەوەوە كە دەستدرێژكار بوون‌و سنووربەزێن بوون.

ئنجا ئایەتی دووەم، وەك باسم كرد خوا ﷻ ڕاستییەكی زۆر گەورەی تێدا دەخاتە ڕوو، كە بریتیە لە دانانی تەرازوویەك بۆ هەڵسەنگاندن‌و كێشانی ئیمان‌و دینداریی، دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ الَّذِينَ آمَنُوا ﴾، كە مەبەست پێی مسوڵمانانە ﴿ وَالَّذِينَ هَادُوا ﴾، كە مەبەست پێی جوولەكەكانە، وشەی: (هَادوا) یانی: (رَجَعوا) گەڕانەوە، وەك خوا ﷻ لە سوورەتی (الأعراف)دا لەسەر زمانی مووسا ﷺ دەفەرموێ: ﴿ ... إِنَّا هُدْنَا إِلَيْكَ ... ﴿١٥٦﴾ ﴾، واتە: (إنَّا رَجَعْنَا إلَيْكَ) ئێمە بۆ لای تۆ گەڕاینەوە. ﴿ وَالنَّصَارَىٰ ﴾، كۆی (نصراني)یە، كە مەبەست پێی شوێنكەوتووانی عیسایە ﷺ، ﴿ وَالصَّابِئِينَ ﴾ ئەمانیش توێژەرانی قورئان‌و مێژوونووسان دەربارەیان زۆر ڕاجیان، هەندێكیان دەڵێن: ئەوانەن كە ئەستێرە پەرستن، وە هەندێك دەڵێن: ئەوانەن كە خۆیان بە شوێنكەوتەی (نوح) دەزانن، وە هەندێك دەڵێن: ئەوانەن كە خۆیان بە شوێنكەوتەی (یحیى) دەزانن، وە

---

١) بڕوانە (التفسير التطبيقي للكتاب المقدّس)، العهد القديم، سفر إرميا، الإصحاح: (٢)، ص (١٤٨٠)، كە لە زمانی (إرميا)وە نەقڵ دەكات كە بە حیساب یەكێكە لە پێغەمبەران كە بە گەلەكەی دەڵێ: (وافترست سيوفكم أنبياءكم كأسدٍ كاسرٍ)، واتە: وە شمشێرەكانتان وەك شێری تێكشكێنەر پێغەمبەرانیان ڕاوكرد -كوشت-).

هەروەها بڕوانە: العهد الجديد، سفر أعمال الرسل، الإصحاح: (٧)، ص (٢٢٩٠)، كە لە شەرحەكەیدا دەڵێ: (أنبياءٌ كثيرون لاقوا الإضطهاد بين اليهود: إرميا، إشعياء، عاموس، زكريا، إيليا)، واتە: پێغەمبەرانێكی زۆر لەنێو جوولەكەدا تووشی چەوسێنرانەوە بوون: (ئیرمیاء، ئیشعیاء، عامووس، زەكەریا، ئیلیا)، كە دیارە مەبەستی پێی كوشتنیانە.

هەندێك دەڵێن: ئەوانەن كە خۆیان بە شوێنكەوتەی (داوود) دەزانن (سەلامی خوا لەسەر هەموو پێغەمبەران بێت)، هەندێكیش دەڵێن (صابئة) لە (صَبَأَ)وە هاتوە، واتە: لە دینەكەی خۆی دەرچوو، كەواتە: ئەوانەن كە لە دینێكەوە گواستوویانەتەوە بۆ دینێكی دیكە، بەهەر حاڵ ئەوانە ئێستا هەن لە ئێران‌و لە عێراقیشدا، بەڵام ژمارەیان كەمەو خۆیان بە خاوەن كتێبی ئاسمانیی دەزانن، جا خوا ﷻ دەفەرموێ: هەر كام لەو چوارانە مسوڵمانان‌و جوولەكەو نەصرانیی‌و صابیئە، ﴿ مَنْ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْـَٔاخِرِ وَعَمِلَ صَٰلِحًا ﴾، ئا ئەوە پێوەرو تەرازوویە: هەر كامێكیان ئیمان بە خوا بێنێ، ئیمانی ڕاست‌و دروست، وە ئیمان بە ڕۆژی دوایی بێنێ، وە كردەوەی باشیش ئەنجام بدا، ﴿ فَلَهُمْ أَجْرُهُمْ عِندَ رَبِّهِمْ وَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴾، ئەوە پاداشتیان لای پەروەردگاریان پارێزراوەو نەترسیان لەسەرەو نەغەم‌و پەژارەش دایاندەگرێ، كەواتە سەنگی مەحەك ئەوەیە، كێ بەڕاستی ئیمانی بەخواو ئیمانی بە دوارۆژ هەیە، ئیمانی بەو سەرەتا (مَبدأ)یە هەیە، كە لێوە هاتوەو، ئیمانی بەو سەرەنجام (مَصیر)ە هەیە، كە بۆی دەچێ، وە لەو نێوانی ئەو هاتن‌و ڕۆیشتنەشدا، كردەوی باش ئەنجام بداو، ژیانەكەی بە شێوەیەك بگوزەرێنێ كە خوا لێی ڕازی بێ، ئا ئەوە سەنگی مەحەكی دینداریيە، وە ئەوە سەنگی مەحەكی ڕاست‌و دروست بوونە لەگەڵ خواو بەندایەتیی كردن بۆ خوادا.

## چەند مەسەلەیەكی گرنگ

**مەسەلەی یەكەم:** جوولەكەكان نازو نوزی زۆریان كردوەو بڕو بیانووی زۆریان بە مووسا ﷺ گرتوە، یەكێك لە بیانووەكان ئەوە بووە كە باسمان كرد، كە گڕنە لە مووسا دادەگرن خواردن‌و خۆراكی جۆراوجۆریان بۆ دابین بكات ! لە حاڵێكدا كە لەو دەشت‌و بیابانەی (سینا)دا خوا ﷻ دوو جۆرە خۆراكی بۆ داناون، كە كیفایەتی جەستەی ئینسان دەكەن، یەكیان شوێنی میوە دەگرێ‌و شیرینی‌و كاربۆهیدراتی تێدایە كە گەزۆیەو، ئەویدیكە شوێنی خۆراك

دەگرێ، کە گۆشتەو پرۆتیناتو چەوریی تێدایە، دیارە لەو بیابانەشدا هەر ئەوە پەیدا دەبێ، هەڵبەتە خوا ﷻ دەیتوانی هەموو شتێکیان بۆ پەیدا بکات، بەڵام ئەوەندە خواردنە کافییە بۆ جەستەی ئینسان، تاکو ژیانی پێ بەرێوەبچێ، وە خوای کاربەجێ ویستوویەتی ئەوانە بە ژیانێکی سادەو بە خواردنو خۆراکێکی سادەوە ڕابێنێ، چونکە میللەتێك بیەوێ بە ئازادیی بژیێ، دەبێ تەکلیفی ژیانی کەم بێو، نابێت چاوی لە خواردنی جۆراو جۆرو ڕەنگینو بەرگو پۆشاکی چاكو خانووبەرەی خۆشو...هتد بێ، بەڵکو دەبێ هەوڵ بدات بە ژیانێکی سادە، قەناعەت بە خۆی بکات.

**مەسەلەی دووەم:** ڕاهاتن بە خۆشگوزەرانییەوە شتێکی خراپە، وەچەی ئیسرائیل لەبەرئەوەی کە لە میسر هەرچەندە ژێردەستە بوون، بەڵام شار بووەو لەژێر دەسەڵاتی فیرعەوندا بێگومان ڕاددەیەك شارستانێتیو پێشکەوتن هەبووەو خەڵك لەوێ خۆشگوزەران بووە، جا ئەوان چونکە بە خۆشگوزەرانییەوە ڕاهاتوون، تەماشا دەکەی لەکاتی تەنگانەدا ئەو ڕاهاتنە بەو خۆشگوزەرانییەوە، لەو کاتی تەنگانەیاندا وەدەر دەدات، بۆیە لە عومەری کوڕی خەتتاب (خوا لێی ڕازی بێ) گێڕراوەتەوە، کە فەرموویەتی: {(إِخْشَوْشِنوا فَإِنَّ النِّعَمَ لاَتَدُوم)} واتە: زبربن، چونکە نیعمەتەکان بەردەوام نابن، وە (أبو حامد الغزالي) لە کتێبی (إحياء علوم الدين)دا لەباسی پەروەردەی منداڵدا دەڵێ: ئەگەر کابرا هەبووش بێ، واباشە جارجار بەس نانی وشكو خواردنی سادە بدات بە منداڵەکانی، بۆئەوەی ئەگەر ڕۆژێك لە ڕۆژان لێیان قەوما، تووشی بەسەرداکەوتن نەبنو خۆڕاگرو دامەزراوبن.

**مەسەلەی سێیەم:** بەڕاستی ئازادییو ژیانی ئازادانە باجی خۆی دەوێ، وادیارە وەچەی ئیسرائیل ئەو باجەیان زۆر لەسەر دڵ قورس بووە، چونکە ئەوەندە بە کۆیلایەتییەوە ڕاهاتوونو ئەوەندە ژیانی چەوساوەییان دیوە، کە زۆر خوارو خێچیی فیکرییو سلوکییان تێدا پەیدابووە، وەك زانایانی کۆمەڵناس دەڵێن: هەر میللەتێك زۆر چەوسایەوەو ستەمی لێکرا، کۆمەڵێك عەیبو عارو

کەموکووڕیی تێدا پەیدا دەبن، کە مەگەر زۆر جەریئانە خۆی لەو کەموکووڕییانە بژار بکا، ئەگەرنا وردە وردە هەر لەگەڵی دەمێنن، هەڵبەتە میللەتی ئێمەش زۆر لەو عەیبو کەموکووڕییانەی پێوە دیارن، لەسەری سەرێوە تا خواری خوارێ (واتە: حوکمڕانو بڕیاربەدەستانو خەڵکیش) کە شوێنەواری سەردەمی ڕژێمی بەعسن، کە ماوەیەکی زۆر لەژێر نیرو چەکمەی ڕژێمی بەعسدا گوزەراندوویەتیو کۆمەڵێك عەیبوعارو کەموکووڕیی پێوە نووساونو مەگەر ئەم خەڵکە ئیمانێکی چاکی هەبێو، زۆر چاك بگەڕێنەوە بۆ لای خوای پەروەردگارو خۆی بژاربکا، ئەگەرنا ئەو کەموکووڕییانەی هەر پێوە دەمێنن، ئەگەر زیادیش نەکەن[١] !.

**مەسەلەی چوارەم:** مووسا ﷺ دەفەرموێ: ﴿ أَتَسْتَبْدِلُونَ ٱلَّذِى هُوَ أَدْنَىٰ بِٱلَّذِى هُوَ خَيْرٌ ﴾، ئایا خواردنێك کە خراپترە هەڵیدەبژێرن بەسەر خواردنێکی چاکتردا، واتە: خواردنە چاکەکە پاڵ پێوەدەنێنو هی خراپتری دێننە جێی؟! لێرەدا مەبەست ڕووی مەعنەوییە، چونکە ئەو خواردنە سادەیە ئازادیی لەگەڵ دایە، بەڵام خواردنە جۆراو جۆرەکە کۆیلایەتیو ژێردەستەییو زەبوونیی لەگەڵدایە، جا ئینسان کە سەربەستو ئازاد بوو، با ژیانیشی سادەبێ بەڕاستی زۆر خۆشترو بەلەزەتترە، لەوەی کە لە زیندانی بکەن، یاخود ژێر چەپۆكو ڕەزیلو ژێردەست بێ، بەڵام باسەری هەر لە پڵاو گۆشتی بگرن، بۆ کەسێك کە خاوەنی شەهامەتو جوامێریی بێ، ژیانی سادەو خواردنی سادە لەگەڵ ئازادییدا هەڵدەبژێرێ بەسەر خۆشگوزەرانیی یەکی زەبوونانەی ژێرچەپۆکانەدا.

**مەسەلەی پێنجەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ ٱهْبِطُوا۟ مِصْرًا ﴾، توێژەرانی قورئان هەندێکیان دەڵێن: مەبەستی پێ شاری میسرە، واتە: بگەڕێنەوە بۆ میسر، تاکو لەوێ فیرعەونێکی دیکە دووبارە بتانچەوسێنێتەوەو خواردنی خۆشیش بخۆن! بەڵام

---

١) لە کتێبی: (واقیعی هەرێمی کوردستان، دیدێکی ئیسلامیانە)دا تیشکمان خستۆتە سەر ژمارەیەك لەو نەخۆشییانە.

لەبەرئەوەی کە وشەی (مِصراً) بە نەزانراو (نَکِرَة) هاتوە، ئەو مانایە ڕاست نیە، بەڵکو مەبەست لە (مِصراً) هەر شارێکە، چونکە بچنە هەر شارێکەوە حەتمەن ئاغاو کوێخاو طاغووتێکی لێیە، ئەو کاتە وابووە، کەواتە: بچن بۆ هەر شارێك لە شاران تاکو زەلیلانە بژین‌و خواردنی خۆشیش بخۆن، ئەگەر ڕازی نین‌و ئامادەنین باجی ژیانی ئازادانە بدەن، ئەوە سەرەنجام‌و چارەنووستان دەبێت.

**مەسەلەی شەشەم:** کە دەفەرموێ: ﴿وَضُرِبَتْ عَلَيْهِمُ ٱلذِّلَّةُ وَٱلْمَسْكَنَةُ﴾، زەبوونی‌و نەداریی یان لەسەر فەرزبوو، زانایان دەڵێن: (الرَّذائِل يَجُرُّ بَعضُها بَعضاً)، واتە: سیفەتە خراپەکان هێندێکیان هێندێکیان پەلکێش دەکەن، ئەوانە کە ئامادەنەبوون بە ژیانی سادە بگوزەرێنن، ژێردەستەییان لەسەر فەرز کراوەو، سەرەنجام نەدارییان لەسەر فەرز کراوە، ئەوەش سەری کێشاوە بۆ ئەوە کە عەیب‌وعاری دیکەشیان تێدا پەیدابن، هەروەها سیفەتە چاکەکانیش هەندێکیان هەندێکیان پەیدا دەکەن، وەك پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {(إنَّ الصِّدْقَ يَهدِي إلَى البِّر وإنَّ الكَذِبَ يَهدِي إلى الفُجُور) (رَوَاهُ البُخَارِيُّ برقم: (٦٠٩٤)، وَمُسْلِم برقم: (٦٥٨٠)، عَن أَبِي وَائِلٍ، عَنْ عَبْدِ الله رضي الله عنه}، واتە: ڕاستگۆیی ئینسان بەرەو چاکە دەبا، وە درۆزنیی ئینسان بەرەو خراپە دەبات.

**مەسەلەی حەوتەم:** حیکمەتی ئەوە چییە کە خوا ﷻ ئەو ئایەتەی لەوێدا هێناوە، کە دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَٱلَّذِينَ هَادُواْ وَٱلنَّصَٰرَىٰ وَٱلصَّٰبِـِٔينَ مَنْ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ وَعَمِلَ صَٰلِحًا فَلَهُمْ أَجْرُهُمْ عِندَ رَبِّهِمْ وَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ﴾، کە وەك بڵێی ئایەتێکە کراوەتە نێواخنی ئەو قسەوباسانەی کە لەگەڵ جوولەکەکاندا دەکرێن؟! زانایان دەڵێن: دوو حیکمەتی تێدان:

**یەکەم/** بۆ ئەوە کە خوا ﷻ ئەوەندە زەمی جوولەکەکان دەکات لەسەر خراپەو کەموکوورییەکانیان، ئەو جوولەکانەی کە مسوڵمان دەبن، دڵیان لە خۆیان دانەمێنێ‌و پێیان وابێ باب‌و باپیرانیشیان هەرخراپ بوون، نەخێر بەڵکو

ئەوانەیان کە چاك بوون، لە بابو باپیرانیان هی جوولەکە، هی نەصرانیی، هی صابیئە، هی موشریکەکان ... هتد، مادام ئەو کاتە لەسەر ئایینو بەرنامەی ئەو سەردەمەی خۆیان بووبنو لەگەڵیاندا ڕاستیان کردبێ، ئەوە مانای وایە سەرفرازو بەختەوەرن.

**دووەم/** بۆ ئەوەی مسوڵمانانیش هەر لە خۆوە فریو نەخۆنو لەخۆبایی نەبن، پێیان وابێ هەر چونکە ناویان مسوڵمانە، تازە پێویستییان بە هیچ شتێك نیە! بەڵکو دەبێ بەڕاستی ئیمانت بە خواو ڕۆژی دوایی هەبێ، وە کردەوەی باشیشت هەبێ، ئنجا مسوڵمانەتییەکەت نێوەڕۆکی هەیە.

وە لە کۆتاییدا دەڵێین: ئەم ئایەتە لەلایەن هەندێ مەلای دین فرۆشەوە مانایەکی هەڵەی لێدراوەتەوە، دەڵێن: ئەوە کە خوا ﷻ دەفەرموێ: بڕواداران و جوولەکەو نەصرانییو صابیئە، هەر کەسێ ئیمانی بە خواو بە ڕۆژی دوایی هەبێ، وە کردەوەی چاك بکات، ئەوە پاداشتی لای پەروەردگاری هەیەو ترسو پەژارەی نیە، دەڵێن: کەواتە: هەموو ئەوانەی کە خاوەن کتێبی ئاسمانیین، هەر کەسە بە دینی خۆی مادام ڕاست دەکەن لەگەڵ دینی خۆیاندا، ئەوە بەهەشتینە! بەڵام بێگومان ئەمە مانایەکی زۆر غەڵەتە، وە پێچەوانەی چەندان ئایەتی خوای پەروەردگارە، بۆ وێنە خوای زاناو شارەزا لە سووڕەتی (آل عمران)دا دەفەرموێ: ﴿ ...وَقُل لِّلَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ وَالْأُمِّيِّينَ أَأَسْلَمْتُمْ ۚ فَإِنْ أَسْلَمُوا فَقَدِ اهْتَدَوا ...﴿٢٠﴾ ﴾، واتە: وە ئەوانەی کە کتێبیان پێدراوەو ئەوانەش، کە نەشارەزان (لە کتێبەکانی خوا) پێیان بڵێ: ئایا مسوڵمان بوون؟ جا ئەگەر مسوڵمان بوون (یان گەردنکەچبوون بۆ ئایینی ڕاستو دەستکاریی نەکراوی خوا) ئەوە ڕێی ڕاستیان گرتوە.

وە خوای بێ وێنە هەر لە سووڕەتی (آل عمران)دا دەفەرموێ: ﴿ وَمَن يَبْتَغِ غَيْرَ الْإِسْلَامِ دِينًا فَلَن يُقْبَلَ مِنْهُ وَهُوَ فِي الْآخِرَةِ مِنَ الْخَاسِرِينَ ﴿٨٥﴾ ﴾، واتە: وە هەرکەس جگە لە ئیسلام بەرنامەیەکی دیکە بخوازێ، بێگومان لێی وەرناگیرێو لە دواڕۆژیشدا لە زیانبارانە. کەواتە: ئەوە غەڵەتە بڵێی: جوولەکەو نەصرانییو

صابیئە، هەرکەسێ ئێستا دینی خۆی پیادەبکات، مانای وایە لە قیامەت سەرفرازە! نەخێر ئەو مانایە غەڵەتە، بەڵام ئەم ئایەتە دوو مانای ڕێكو ڕاستی هەن:

**مانای یەکەم:** بە نسبەت ڕابردووەوەیە، واتە: لە ڕابردوودا، ئەگەر جوولەکە بەڕاستی پەیڕەوییان لە دینی خۆیان کردبێو، لەگەڵ کتێبی خۆیانو پێغەمبەری خۆیاندا کە تەوراتو مووسان ڕاستیان کردبێ، وە نەصرانیی‌یەکان ئەگەر لەگەڵ عیساو لەگەڵ ئینجیلدا ڕاستیان کردبێ، وە صابیئە ئەگەر لەگەڵ دینی خۆیاندا ڕاستیان کردبێ، هەروەها مسوڵمانان ئەگەر لەگەڵ دینی خۆیاندا ڕاستیان کردبێ، ئەوە ئەوانە هەموویان سەرفرازو بەختەوەرن.

**مانای دووەمی:** بۆ ئێستاو داهاتوویە، واتە: ئێستاو لەمەودوا ئەگەر مسوڵمانان بەڕاستی خاوەنی ئیمانو کردەوەی باش بن، وە جوولەکە ئەگەر ئیمانێ بێننو کردەوەی باش بکەن، وەك شەریعەتی ئیسلام دەڵێ، وە نەصرانییو صابیئەش بەهەمان شێوە، ئەگەر ئیمان بێنن بەڕاستییو کردەوەی باشیش بکەن بەپێی شەریعەتی کۆتایی خوای پەروەردگار، ئەوە ئەوانە هەموویان سەرفراز دەبن.

خوای پەروەردگار ئێمەو سەرجەم مسوڵمانان لەوانە بگێڕێ، کە تەنها بەناوی مسوڵمانەتیی ئیکتفا ناکەن، بەڵکو ئیمانی باشیان دەبێو پابەند دەبن بە شەریعەتی خواوەو، بەپێی ڕێوشوێنو ڕێبازی پێغەمبەری خوا ﷺ بەرێوەدەچن.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی سێزدەیەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان لە زنجیرە دەرسی تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، لە چوار ئایەت پێك دێت، ئایەتەكانی: (٦٣ تاكو ٦٦)، لەم چوار (٤) ئایەتەدا خوا ﷻ دوو لە عەیبو كەموكوورییەكانی بەنی ئیسرائیل بە چاوی نەوەكانیاندا دەداتەوە، كە:

**یەكەمیان/** ئەوەیە كە بە حاڵێكی زۆر سەخت پەیمانیان لێوەرگیرا، كە پابەند بن بە تەوراتەوە، كەچی دواییش وەك پێویست پێوەی پابەند نەبوون.

وە **دووەمیان/** ئەوەیە كە كۆمەڵێك هەبوو ون لە شارێك لەكەنار دەریایەك كە هەرچەندە ئیشكردنیان لە ڕۆژی شەممەدا لێ قەدەغەكراوە، بەڵام ئەو قەدەغەیان شكاندوەو خوای بەرز بە شێوەیەكی سەخت سزای داون، وەك لە درێژەی ئایەتەكاندا باسی دەكەین.

﴿ وَإِذْ أَخَذْنَا مِيثَٰقَكُمْ وَرَفَعْنَا فَوْقَكُمُ ٱلطُّورَ خُذُوا۟ مَآ ءَاتَيْنَٰكُم بِقُوَّةٍ وَٱذْكُرُوا۟ مَا فِيهِ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ﴿٦٣﴾ ثُمَّ تَوَلَّيْتُم مِّنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ ۖ فَلَوْلَا فَضْلُ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُۥ لَكُنتُم مِّنَ ٱلْخَٰسِرِينَ ﴿٦٤﴾ وَلَقَدْ عَلِمْتُمُ ٱلَّذِينَ ٱعْتَدَوْا۟ مِنكُمْ فِى ٱلسَّبْتِ فَقُلْنَا لَهُمْ كُونُوا۟ قِرَدَةً خَٰسِـِٔينَ ﴿٦٥﴾ فَجَعَلْنَٰهَا نَكَٰلًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهَا وَمَا خَلْفَهَا وَمَوْعِظَةً لِّلْمُتَّقِينَ ﴿٦٦﴾ ﴾.

## مانای وشە بە وشەی ئایەتەکان

((وە یادبکەنەوە (ئەی جوولەکەکان) کاتێك پەیمانێکی پتەومان لێتان وەرگرت (واتە: لە پێشووەکانتان)، وە کێوی طوورمان بەسەر سەرتانەوە بەرزکردەوە (پێمان گوتن): ئەوەی پێماندا‌ون (لە بەرنامەو شەریعەت) بە توندیی بیگرن‌و بزانن چی تێدایە! بەڵکو پارێز بکەن ﴿٦٣﴾ کەچی دوای ئەوە پشتتان هەڵکردو، ئەگەر چاکەو بەزەیی خوا نەبووایە بەسەرتانەوە، لە زیانباران دەبوون ﴿٦٤﴾ وە (بەسەرهاتی) ئەوانەتان زانی، کە لە شەممەدا دەستلرێژیی یان کردو، پێمانگوتن: ببنە مەیموونی پەست ﴿٦٥﴾ وە گێڕامان (واتە: ئەو ڕووداوە) بە مایەی پەند وەرگرتن‌و سڵەمینەوەی خەڵکی ڕۆژگاری خۆیان‌و هی دوای خۆشیان، وە بە ئامۆژگاریی بۆ پارێزکاران﴿٦٦﴾ )).

## شیکردنەوەی هەندێك لە وشەکان

(**مِيثَٰقَكُمۡ**): (الـميثَاقُ: عَقدٌ مُؤكَّدٌ بِيَمينٍ وَ عَهدٍ) واتە: (میثاق) بریتیە لە گرێبەستێك کە جەختی لەسەر کرابێتەوە، بە سوێند لەسەر خواردن‌و پەیمان لەسەر وەرگیران.

(**ٱلطُّورَ**): (الطُّورُ: اسْمٌ جَبَلٍ مَخْصُوصٍ، وقيلَ: اسْمٌ لِكُلِّ جَبَلٍ)، واتە: (طور) ناوی چیایەکی تایبەتە، کە توێژەرانی قورئان دەڵێن: مووسا ﷺ لەسەر ئەو چیایە کە لە دەشتی (سینا)یە، گفتوگۆی لەگەڵ خوا کردوەو تەوراتی لەسەر ئەو چیایە لە خوا ﷻ وەرگرتوە، کە بێگومان فریشتە بۆیان هێناوە، هەندێکیش دەڵێن: وشەی طوور ناوی هەر چیایەك‌و هەر شاخێکە بە گشتی.

(**خَٰسِـِٔينَ**): (قِيلَ خَسَأْتُ الكَلْبَ، أي: زَجَرْتُهُ مُسْتَهِيناًبِهِ فانْزَجَرَ، وكَذَلِكَ إذَا قُلْتَ لَهُ: إخسأْ) لە کوردەواریی خۆماندا، کە سەگ دەنگ دەدرێ دەڵێن:

(چغە)، دەگوترێ: (خَسَأْتُ الكَلْبَ)، واتە: چەغەم لە سەگەکە کردو دەنگمدا بە سووکیی ئەویش سڵەمییەوە، (خاسئین)یش کۆی (خاسیء)ە، واتە: کەسێك بە سووکایەتیی پێکرانەوە دەرکرابێ و بێدەنگ کرابێ، یان سزا درابێ.

(نَكَالًا )، (نكّلْتُ بِهِ: إذَا فَعَلْتَ بِهِ مَا يُنَكَّلُ بِهِ غَيرُهُ واسم ذَلِكَ الفعل النَّكَالُ)، کە تۆ سزای کەسێکت دا خەڵکی دیکەی پێوە تەمبێ بێ، وە پەندی لێ وەربگرێ، ئەو کردەوەیەی کە تۆ لەگەڵ کەسێکدا دەیکەی پێ عیبرەتگرتوو بێ و پێ تەمبێ خواردوبێ، پێی دەگوترێ: (نَكال)، (نَكال)یش لە (نِكْل)ەوە هاتوە (والنِّكل: قيْدُ الدَّابَّةِ وحَديدِة اللِّجَام لِكَونِهما مانعين، والجَمْعُ: أَنكال)، (نِكْل) بە پێوەندی پێی وڵاخ دەگوترێ، وە بەو ئاسنە دەگوترێ، کە دەکرێتە لغاوی وڵاخە بەرزەو دەخرێتە نێو زاری، چونکە هەم ئەو پێوەندەی، کە دەخرێتە پێی وڵاخەوە، قەدەغەی دەکات لەوە کە بەملاو بەولادا بڕوا، وە هەم ئەو ئاسنەی دەخرێتە دەمی ئەسپیشەوە، ڕێی لێدەگیرێ، لەوە کە گیاو لەوەڕ بخوات، کۆی (نِكْل)یش (أَنكَال)ە.

(بَيْنَ يَدَيْهَا )، پێشی، واتە: ئەوانەی لە پێشی بوون.

(وَمَا خَلْفَهَا )، دوایی، واتە: ئەوانەی لە دوای بوون.

(وَمَوْعِظَةً )، (الوَعْظُ: زَجْرٌ مُقْتَرِنٌ بِتَخْوِيفٍ) (وَعْظ) تێوە خوڕینێکە، کە هاوکات بێ لەگەڵ ترساندن، وە خەلیلی کوڕی فەڕاهیدیی دەڵێ: (الوَعْظُ: هُوَ التّذكِير بالخَيرِ فِيمَا يَرُقُّ لَهُ القَلْبُ وَالعِظَةُ وَالموعِظَةُ: اسمٌ) واتە: (وَعْظ) ئەوەیە، کە تۆ بیری کەسێك بخەیتەوە ئامۆژگاریی بکەیت، بە شێوەیەك کە دڵی نەرم بێت، وە هەرکام لە (عِظَةُ) و (مَوعِظَة) ناون، کە بە کوردیی دەڵێین: ئامۆژگاریی.

## مانــای گــشــتی ئـایـەتـەکــان

خوا ﷻ دوای ئەو ئایەتەی، کە لە دەرسی پێشوودا تەفسیرمان کردو، کردی بە ناواخن بۆ دواندنی خاوەن کتێبەکان بەگشتیو جوولەکەکان بە تایبەت، لەبەر ئەو دوو حیکمەتەی کە باسمان کردن، دێتەوە سەر دوواندنی جوولەکەکانو خستنە ڕووی ئەوەی کە لەگەڵ پێشینانیان کردوویەتی، جا چ نیعمەتی بەسەریاندا ڕشتبێ، وەك لە دەرسەکانی ڕابردوودا باسمان کرد، چ تووشی سزاو جەزرەبەی خوا بووبن، بەهۆی سەرەخەریی‌و لاملییو لادانیانەوەو دەفەرموێ: ﴿ وَإِذْ أَخَذْنَا مِيثَٰقَكُمْ ﴾، واتە: یادبکەنەوە کاتێ کە پەیمانێکی زۆر پتەومان لێتان وەرگرت، کە دوایی باسی دەکەین، ئەو پەیمانە چەند بڕگە بووە چۆن بووە؟ ﴿ وَرَفَعْنَا فَوْقَكُمُ ٱلطُّورَ ﴾، وە طووڕمان بەسەر سەرتانەوە ڕاگرت، کێوی طووڕ، یاخود چیایەك لە چیایەکان، یاخود چیایەك کە لە کێوی طووڕە، ئەو پەیمان وەرگرتنەش بۆ ئەوەبوو، کە ڕەفتار بە تەورات بکەنو پابەندبن بەو شەریعەتەوە کە مووسا ﵇ لە خواوە بۆی هێناون، بۆئەوەی ژیانی تاکییو خێزانییو کۆمەڵایەتییان، بەپێی ئەو بەرنامەیە ڕێکبخەن، ﴿ خُذُواْ مَآ ءَاتَيۡنَٰكُم بِقُوَّةٖ ﴾، (وە پێمانگوتن) ئەو بەرنامەیەی پێمانداون بە توندیی بیگرنو بە جیددییو پێوەی پابەند بنو مامەڵەو ڕەفتاری پێ بکەن، جارێ سەرەتا بە جیددیی بیگرن، دوایی هەوڵبدەن بزانن چی تێدایە ﴿ وَٱذۡكُرُواْ مَا فِيهِ ﴾، واتە: وە دیراسەی بکەنو لێی بکۆڵنەوەو تێی بفکرن، بزانن چی تێدایە ﴿ لَعَلَّكُمۡ تَتَّقُونَ ﴾، بەڵکو تەقواتان پەیدابێ، کەواتە: تەقوا لە ئەنجامی پابەندیی بە شەریعەتی خواوە پەیدا دەبێ، سەرەتا پێویستە ئینسان شەریعەتی خوا وەربگرێو ئیمانی پێ بێنێو بە جیددیی وەریبگرێ، دوایی هەوڵبدا تێیبگا، ئیدی لە ئەنجامی ئەوەدا وەك لە دەرسەکانی ڕابردووش باسمان کرد، ئینسان تەقوای پەیدادەبێو زیاد دەبێ.

﴿ ثُمَّ تَوَلَّيۡتُم مِّنۢ بَعۡدِ ذَٰلِكَ ﴾، ئنجا دوای ئەوەش پشتتان تێکرد، دیارە مەبەست پێی زۆربەیانە، ئەگەرنا بەتەئکید هەندێکیان پێوەی پابەند بوون، بەڵام

دیـاره زۆربـەیان پابەنـد نـەبوون، ئنجـا دەفـەرموێ: ﴿ فَلَوْلَا فَضْلُ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُۥ لَكُنتُم مِّنَ ٱلْخَٰسِرِينَ ﴾، ئەگـەر بەخشـشی خـواو بـەزەیی خـوا نەبووایـە بەسـەرتانەوە، بێگومـان لـە زیانبـاران دەبـوون، بـەڵام خـوا لێبوردنی زۆره لەگـەڵ بەنـدەکانیو چاوپۆشـیی زۆره، ئـەوەتا لەگـەڵ ئـەو پـەیمان شکاندنەشـیاندا، دوای ئـەوەی پەشێمان بوونەوەو تۆبەیان کردوه، خوا لێیـان خۆشـبووه، ئنجـا دێتـە سـەر بـاسو مەسـەلەیەکی دیکـە، کـە سـەرکۆنەو سەرزەنـشتیی ئەوانـەی سـەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺی پێدەکات، چونکه بەڵێ بابو باپیـرانیان وایـانکردوه، بـەڵام ئەوانیش بەتەئکید بابو باپیـرانی خۆیانیان بە پەسند زانیوه، وه دیفاعیشیان لـە هەڵوێـستەکانیان کـردوه، بـە بەڵـگەی ئـەوه کـە لەسـەر هـەموو شـتەکانیان هـەر ڕۆیـــشتوونو بـــەردەوام بـــوون: ﴿ وَلَقَدْ عَلِمْتُمُ ٱلَّذِينَ ٱعْتَدَوْا۟ مِنكُمْ فِى ٱلسَّبْتِ ﴾، وه بێگومـان ئێـوه ڕووداوی ئەوانـە دەزانـن، کـە لـە شـەممەدا دەسـتدرێژییان کـردووو یـاخیی بـوونو سـنووریان بەزانـد ﴿ فَقُلْنَا لَهُمْ كُونُوا۟ قِرَدَةً خَٰسِـِٔينَ ﴾، ئێمـەش لـە سـزای ئـەوەدا پێمـانگوتن: ببنـە مـەیموونی پەسـتو زەبـوون، هەڵبەتـە ئینـسان وەختێك دەبێته مەیموون، مانای وایه زۆر پەستو نزمو زەبوون بووه! ﴿ فَجَعَلْنَٰهَا نَكَٰلًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهَا وَمَا خَلْفَهَا ﴾، ئنجـا ئـەو سـزایەمان (کـە ئەوانـەمان گێـڕا بـە مەیموون) کرد بە مایەی تەمبێ بوونو پەندوەرگرتنی هەموو ئەو خەڵکەی، کە لە دەوروبەریان بوونو هاوچەرخیان بوون، وه ئەوانەی لە دوای ئەوانیشەوه دێـن کـە پەنـدی لـێ وەربگـرن، لێـرەدا جێـی سـەرنج ئەوەیـە، کـە جوولەکـەکان وەك لـە دەرسـەکانی ڕابـردوودا باسمـان کـرد، میللەتێکـن خـوای دادگـەر زۆر نیعمـەتو موعجیزەی سەیر سەیری پێداون، بەڵام دیسان سزای زۆر گـەوره گەورەشـی داون ! جا ئەمه ئەوه لێی وەردەگیـرێ، کە هەرکەسێك خوا نیعمـەتی زۆری بـداتێ، ئەگـەر شوکری نیعمەتەکەی نەکرد، خوای دادگەر زۆر بـە تونـدیش سزای دەدات، وەك لـە سـووڕەتی (المـائدة)دا دەفـەرموێ: ﴿ قَالَ ٱللَّهُ إِنِّى مُنَزِّلُهَا عَلَيْكُمْ ۖ فَمَن يَكْفُرْ بَعْدُ مِنكُمْ فَإِنِّىٓ أُعَذِّبُهُۥ عَذَابًا لَّآ أُعَذِّبُهُۥٓ أَحَدًا مِّنَ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١١٥﴾ ﴾، دوای ئەوەی کۆمەڵـێك

لە شوێنكەوتووانی عیسا ﷺ (حەوارییەكان) داوایان لێكرد، گوتیان: دەبێ سفرەیەكمان لە ئاسمانێ وە بۆ بێنیە خوارێ، سفرەیەك خواردن كە لێی بخۆین، عیساش ﷺ بۆ ئەو مەبەستە لە خوا پاڕایەوە، خوای پەروەردگار فەرمووی: من سفرەیەكتان لە ئاسمانێ وە بۆ دادەبەزێنم، كە هەموو جۆرە خواردنێكی تێدابێت، بەڵام لەمەودوا هەر كامێك لە ئێوە بێبڕوا بێت، بە جۆرێك سزای دەدەم لەنێو جیهانییاندا كەسم وا سزا نەدابێ! جا هەندێك لە توێژەرەوانی قورئان دەڵێن: عیساو ﷺ حەوارییەكانە كە ئەو وەڵامەیان لە خوا بیست، گوتیان: سفرەكەمان هەر ناوێ، ترسان لەوەی كە هەندێكیان دوایی لاساربن‌و خوا سزایان بدا، وە هەندێكیان دەڵێن: گوتیان: (إن شاءَ الله) لاسار نابین‌و سفرەو خوانەكەیان بۆ دابەزی، كە ئەم ڕایەش بەهێزترە، بەڵێ خوا هەركەسێ چاكەی زۆر لەگەڵ بكات، ئەگەر بێت‌و ئەهلی ئەمەگ‌و سوپاس نەبێت، دوایی توندتریش لە خەڵكی دیكە سزای دەدا، وەك خوا ﷻ لە سووڕەتی (الأحزاب)دا بە هاوسەرە بەڕێزەكانی پێغەمبەری ﷺ فەرمووە: هەركامێك لە ئێوە لارێ بێت: ﴿... يُضَٰعَفْ لَهَا ٱلْعَذَابُ ضِعْفَيْنِ... ﴿٣٠﴾﴾ الأحزاب، سزاو ئازاری بۆ دووقات دەكرێتەوە، دیارە ئەگەر چاكیش بن پاداشتیان دوو قاتە، وەك فەرموویەتی: ﴿...نُّؤْتِهَآ أَجْرَهَا مَرَّتَيْنِ... ﴿٣١﴾﴾ الأحزاب، واتە: دوو جار پاداشتی دەدەینەوە، جا دەفەرموێ: ﴿فَجَعَلْنَٰهَا نَكَٰلًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهَا وَمَا خَلْفَهَا وَمَوْعِظَةً لِّلْمُتَّقِينَ﴾، واتە: ئەو بەڵایەی كە سزای ئەو كۆمەڵەمان پێدا، كردمان بە مایەی تەمبێكردن‌و پەند دادانی خەڵكی سەردەمی خۆیان، وەهی دوای خۆشیان، وە كردمان بە ئامۆژگاریی چاك بۆ پارێزكاران، خەڵك بەگشتی پەندو عیبرەت وەردەگرن، بەڵام ئەهلی تەقوا بۆیان دەبێتە ئامۆژگاریی، پەند وەرگرتن زۆرجار بەدەست خۆت نیە عیبرەت‌و پەند وەردەگری، بەڵام ئامۆژگاریی ئیرادەو ئیختیاری خۆتی لەگەڵدایە، وە ئامۆژگاریی وەرگرتن لە ڕاستیدا تەنیا شایستەی ئەهلی تەقوایەو ئینسان بەهۆی تەقواوە ڕووداو بۆی دەبن بە ئامۆژگاریی‌و، بۆی دەبن بە مایەی ئەوە كە زیاتر لە خوا نزیك ببێتەوە.

## چەند مەسەلەیەكی گرنگ

**مەسەلەی یەكەم:** ئەو پەیمانەی كە خوا ﷻ لەبارەیەوە دەفەرموێ: ﴿ وَإِذۡ أَخَذۡنَا مِيثَٰقَكُمۡ وَرَفَعۡنَا فَوۡقَكُمُ ٱلطُّورَ ﴾، ئەو پەیمانە لەدوو شوێنی دیكە لە قورئاندا باسكراوەو پەیمانێكی دوازدە بڕگەییە، دە (١٠) بڕگەی لە ئایەتەكانی (٨٣ و ٨٤)ی سووڕەتی (البقرة)دا باسكراون، كە بەم شێوەیەن: ﴿ وَإِذۡ أَخَذۡنَا مِيثَٰقَ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ لَا تَعۡبُدُونَ إِلَّا ٱللَّهَ وَبِٱلۡوَٰلِدَيۡنِ إِحۡسَانٗا وَذِي ٱلۡقُرۡبَىٰ وَٱلۡيَتَٰمَىٰ وَٱلۡمَسَٰكِينِ وَقُولُواْ لِلنَّاسِ حُسۡنٗا وَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُواْ ٱلزَّكَوٰةَ ثُمَّ تَوَلَّيۡتُمۡ إِلَّا قَلِيلٗا مِّنكُمۡ وَأَنتُم مُّعۡرِضُونَ ﴿٨٣﴾ وَإِذۡ أَخَذۡنَا مِيثَٰقَكُمۡ لَا تَسۡفِكُونَ دِمَآءَكُمۡ وَلَا تُخۡرِجُونَ أَنفُسَكُم مِّن دِيَٰرِكُمۡ ثُمَّ أَقۡرَرۡتُمۡ وَأَنتُمۡ تَشۡهَدُونَ ﴾. دە بڕگەكانی ئەو پەیمانە پتەوەش كە خوا لە جوولەكەكانی وەرگرتوە، ئەمانەن:

١- ﴿ لَا تَعۡبُدُونَ إِلَّا ٱللَّهَ ﴾، بێجگە لە خوا بەندایەتیی بۆ هیچ كەس ناكەن.

٢- ﴿ وَبِٱلۡوَٰلِدَيۡنِ إِحۡسَانٗا ﴾، لەگەڵ باب‌و دایكتان چاكە دەكەن.

٣- ﴿ وَذِي ٱلۡقُرۡبَىٰ ﴾، لەگەڵ خزمان چاكە دەكەن.

٤- ﴿ وَٱلۡيَتَٰمَىٰ ﴾، لەگەڵ هەتیوان چاكە دەكەن.

٥- ﴿ وَٱلۡمَسَٰكِينِ ﴾، لەگەڵ نەداران چاكە دەكەن.

٦- ﴿ وَقُولُواْ لِلنَّاسِ حُسۡنٗا ﴾، وە قسەی چاك بەخەڵكی دەڵێن، چاكە نەبێت بە خەڵكی ناڵێن.

٧- ﴿ وَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ ﴾، وە نوێژ بەرپا دەكەن.

٨- ﴿ وَءَاتُواْ ٱلزَّكَوٰةَ ﴾، وە زەكات دەدەن.

٩- ﴿لَا تَسۡفِكُونَ دِمَآءَكُمۡ﴾، وە خوێنی یەكدی بەناهەق نارێژن.

١٠- ﴿وَلَا تُخۡرِجُونَ أَنفُسَكُم مِّن دِيَٰرِكُمۡ﴾، وە یەكدی لە ماڵو حاڵی خۆتان دەرناكەن، ئەمە دە (١٠) بڕگە، وە لە سوورەتی (المائدة)شدا باسی دوو بڕگەی دیكەش دەكات، كە دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدۡ أَخَذَ ٱللَّهُ مِيثَٰقَ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ وَبَعَثۡنَا مِنۡهُمُ ٱثۡنَيۡ عَشَرَ نَقِيبٗاۖ وَقَالَ ٱللَّهُ إِنِّي مَعَكُمۡۖ لَئِنۡ أَقَمۡتُمُ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَيۡتُمُ ٱلزَّكَوٰةَ وَءَامَنتُم بِرُسُلِي وَعَزَّرۡتُمُوهُمۡ وَأَقۡرَضۡتُمُ ٱللَّهَ قَرۡضًا حَسَنٗا لَّأُكَفِّرَنَّ عَنكُمۡ سَيِّـَٔاتِكُمۡ وَلَأُدۡخِلَنَّكُمۡ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُۚ فَمَن كَفَرَ بَعۡدَ ذَٰلِكَ مِنكُمۡ فَقَدۡ ضَلَّ سَوَآءَ ٱلسَّبِيلِ ﴿١٢﴾﴾، لەوێشدا خوا ﷻ دەفەرموێ: بێگومان خوا پەیمانی لە وەچەی ئیسرائیل وەرگرت، وە دوازدە نەقیب (واتە: مشورخۆر)مان تێدا پەیداكردن، وە خوا فەرمووی: من لەگەڵتانم ئەگەر نوێژ بكەن، وە زەكات بدەن، وە ئیمان بە پێغەمبەرانی من بێنن‌و پشتیان بگرن، وە قەرزی چاكە بدەن بە خوا، ئەوە گوناهەكانتان لێ دەسڕمەوە، وە دەتانخەمە بەهەشتەكانی خۆمەوە، كە ڕووباریان بەژێردا دەڕۆن، وە هەركەسێكتان دوای ئەوە بێبڕوابێ، ئەوە مسۆگەر ڕێی ڕاستی بزركردوە، كەواتە: وەچەی ئیسرائیل (جوولەكە) پەیمانیان لێوەرگیراوە، كە:

١١- ﴿وَءَامَنتُم بِرُسُلِي﴾، ئیمان بە پێغەمبەرانی دوای مووسا بێنن ؈.

١٢- ﴿وَعَزَّرۡتُمُوهُمۡ﴾، وە پشتیان بگرن، مانا وایە كە ئیمان بە پێغەمبەری كۆتایی ﷺ ناهێنن وە پشتی ناگرن، ئەوە ئەو پەیمانەی كە خوا لەگەڵی بەستوون لەسەر دەستی مووسا ؈، دەیشكێنن، كە نەك هەر ئیمانی پێ ناهێنن‌و پشتی ناگرن، بەڵكو دژایەتیشی دەكەن، ئەوە مانای وایە دوو بڕگەی ئەو پەیمانەیان هەڵوەشاندۆتەوە، ئەگەر بڕگەكانی دیكەش هەموو جێبەجێ بكەن.

**مەسەلەی دووەم:** توێژەرەوانی قورئان هەموو لەسەر ئەوە ئەوە یەك دەنگن كە ئەو كێو بەرزكرانەوە بەسەر وەچەی ئیسرائیل دا {كە بەڕاستی ئەوە یەكێك بووە لە موعجیزە هەرە گەورەكانی مووسا ﷺ، وە یەكێك بووە لەو شتە سەرسوڕهێنەرانەی كە خوا بەس بۆ وەچەی ئیسرائیلی كردوون، وەك زۆر شتی دیكە كە تەنیا بۆ ئەوانی كردوە}، كاتێك بووە كە مووسا ﷺ خوا ﷻ تەوراتی پێدەدات، كە لەسەر چەند بەردێكی تەختو لووس (ألواح) نووسراوەتەوە، مووسا تەورات دێنێو بۆیان دەخوێنێتەوەو دەفەرموێ: ئەوە خوای بەرزو مەزن ئەو شەریعەتەی بۆ ئێوە ناردوە كە پێوەی پابەند بن، كەچی ئەوان مل نادەنو سەرپێچی دەكەنو دەڵێن: هەرگیز ئەوەمان پێ جێبەجێ ناكرێ ! بەڵێ ئەو پێغەمبەرە پایە بەرزە ﷺ لە خواوە تەوراتی بۆ هێناونو ئەو هەموو موعجیزانەی پێشان داون، كەچی دەڵێن: پابەند نابین ! هەرچەندە مووسا ﷺ زۆر ئامۆژگارییان دەكات، هەر دەڵێن: نەخێر پابەند نابین ! ئیدی خوا ﷻ كێوی طووڕ لە دەشتی سینا، یان چیایەكی دیكە هەڵدەقەنێو دەیهێنێتە سەر سەریان، وەك هەورێكو مووسا پێیان دەڵێ: خوا دەفەرموێ: پابەند دەبن بە تەوراتەوە، یان نا ؟ ئەوانیش لە ترسان لەسەر لاسەرێكیان كڕنووش دەبەنو بە لاچاوێك تەماشای كێوەكە دەكەنو دەڵێن: با خوا بەسەرمان دانەخاتو پابەند دەبین، جا ئەوەیە كە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَإِذْ أَخَذْنَا مِيثَٰقَكُمْ وَرَفَعْنَا فَوْقَكُمُ ٱلطُّورَ خُذُواْ مَآ ءَاتَيْنَٰكُم بِقُوَّةٍ وَٱذْكُرُواْ مَا فِيهِ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ﴾، هەروەها لە سووڕەتی (الأعراف)یشدا خوای پەروەردگار ئاوا باسی دەكاتو، دەفەرموێ: ﴿ وَإِذْ نَتَقْنَا ٱلْجَبَلَ فَوْقَهُمْ كَأَنَّهُۥ ظُلَّةٌ وَظَنُّوٓاْ أَنَّهُۥ وَاقِعٌۢ بِهِمْ خُذُواْ مَآ ءَاتَيْنَٰكُم بِقُوَّةٍ وَٱذْكُرُواْ مَا فِيهِ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ﴿١٧١﴾ ﴾، واتە: كاتێك كێوەكەمان هەڵقەندو لەسەر سەریان ڕامان گرت، وەك پارچە هەورێكو گومانیان وابرد كە ئێستا بەسەرییان دا دەكەوێ، ئنجا پێمانگوتن: ئەوەی كە پێمانداون بە جیددیی بیگرن، وە بزانن چی تێدایەو كاری پێبكەن، بۆئەوەی

کە خۆتان بپارێزن‌و تەقواتان پەیدابێ.

**مەسەلەی سێیەم:** ئەوانەی کە لە شەممەدا سنوورشکێنییان کرد، بەسەرهاتەکەیان لە سوورەتی (الأعراف)دا باسکراوە وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ وَسْـَٔلْهُمْ عَنِ ٱلْقَرْيَةِ ٱلَّتِى كَانَتْ حَاضِرَةَ ٱلْبَحْرِ إِذْ يَعْدُونَ فِى ٱلسَّبْتِ إِذْ تَأْتِيهِمْ حِيتَانُهُمْ يَوْمَ سَبْتِهِمْ شُرَّعًا وَيَوْمَ لَا يَسْبِتُونَ لَا تَأْتِيهِمْ ۚ كَذَٰلِكَ نَبْلُوهُم بِمَا كَانُوا۟ يَفْسُقُونَ ﴿١٦٣﴾ ﴾، واتە: وە پرسیار بکەن لە وەچەی ئیسرائیل دەربارەی ئەو شارەی کە لەلای دەریاکە بوو، کە خەڵکی ئەو شارە دەستدرێژییان کردو سنوورشکێنییان کرد {بۆ زانیاریتان: جوولەکە شەممەیان لێیان قەدەغەکراوە کە ئیشوکاری تێدا بکەن، وەك چۆن مسوڵمانان ڕۆژی جومعەیان هەیە بۆ ئیسراحەت‌و کۆبوونەوەی هەفتانەیان‌و، نەصرانییەکان یەك شەممەیان هەیە}، جا ئایا ئەو شەممە شکاندنەیان چۆن بووە؟ ڕوونی دەکاتەوە: ﴿إِذْ تَأْتِيهِمْ حِيتَانُهُمْ يَوْمَ سَبْتِهِمْ شُرَّعًا ﴾، واتە: یادبکەوە کاتێك کە لە ڕۆژی شەممەیاندا ماسییەکانیان بەرەوە دەهاتن‌و سەریان بەرز دەکردەوە، ئەوانە وادیارە ڕاوچیی بوو ون‌و ماسییان ڕاو کردوە، خواش لێی قەدەغە کردوون لە ڕۆژی شەممەدا بچنە ڕاوێ، وە بۆ تاقیکردنەوەی ئەوان ڕۆژی شەممان ئەو ماسییانە دەهاتن بە کۆمەڵ سەریان دەردەهێنا لە دەریا، بەڵام لە ڕۆژانی غەیری شەممەدا دیار نەدەمان ئەوانیش هەڵسان گوتیان: تەگبیرێکی دەکەین ! لەلایەك با ڕاوی خۆمان بکەین‌و لە لایەکیش شەممە ناشکێنین، ئیدی فێڵێکیان کرد، بۆیە دەتوانین بڵێین: حیلەی شەرعیی ڕیشەیەکی جوولەکانەی هەیە، ئنجا هەڵسان چییان کرد ؟! لە ڕۆژانی شەممەدا دەیانگوت ڕاوێ ناکەین قەیناکا، بەڵام ماسییەکانیان لەولاڕا دەهێنا بۆ تەنکاوێ، دوایی بەربەستێکیان بۆ دەکردن تاکو ماسییەکان دوایی ڕێیان نەبێ بچنەوە قووڵایی، وە پاشان ڕۆژی یەك شەممە بە ئیسراحەت دەچوون دەیانگرتن !! هەندێك لە توێژەرەوانی قورئان ئاوا دەڵێن، هەندێکیش

دەڵێن: هەر ڕۆژی شەممە دەچوون دەیانگرتو گوتیان: مادام ڕۆژی شەممان نەبێت بە دەستمان ناکەون، دەیانگرین، بەڵام ئەوەی لە زۆربەی تەفسیرەکاندا هاتوە، ئەوەی پێشەوەیە، جا دەفەرموێ: ﴿وَيَوْمَ لَا يَسْبِتُونَ لَا تَأْتِيهِمْ كَذَٰلِكَ نَبْلُوهُم بِمَا كَانُوا يَفْسُقُونَ﴾، واتە وە ئەو ڕۆژەی نەدەکەوتنە شەممەوە ماسی نەدەهاتن، ئاوا تاقییان دەکەینەوە، لەبەر ئەوەی کە لاڕێ بوون دوایی لە درێژەی بەسەرهاتەکەدا باس دەکاتو دەفەرموێ: ﴿وَإِذْ قَالَتْ أُمَّةٌ مِّنْهُمْ لِمَ تَعِظُونَ قَوْمًا اللَّهُ مُهْلِكُهُمْ أَوْ مُعَذِّبُهُمْ عَذَابًا شَدِيدًا قَالُوا مَعْذِرَةً إِلَىٰ رَبِّكُمْ وَلَعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ ﴿١٦٤﴾﴾ الأعراف، واتە: وە یادبکەوە کاتێك کۆمەڵێکیان پێیان گوتن: {یانی: کۆمەڵێك لەو خەڵکە بەو کەسانەیان گوت کە ئامۆژگاری شەممە شکێنەکانیان دەکرد} بۆچی کەسانێك ئامۆژگاریی دەکەن کە خوا هەر لە بەینیان دەبات، یان زۆر بەتوندیی سزایان دەدات؟ (واتە: لە قیامەتدا) گوتیان: ئەو هەڵوێستەی ئێمە هەم عوزر هێنانەوەیەکە بۆ لای پەروەردگارتانو، هەم بەڵکو پارێزیش بکەن، واتە تۆ کە ئامۆژگاریی خەڵك دەکەی، یەکەم: فەرمانێکی خوا جێبەجێ دەکەی، دووەم بەڵکو ئەو کەسە ئیستیفادەیەکی لێبکات ﴿فَلَمَّا نَسُوا مَا ذُكِّرُوا بِهِ أَنجَيْنَا الَّذِينَ يَنْهَوْنَ عَنِ السُّوءِ وَأَخَذْنَا الَّذِينَ ظَلَمُوا بِعَذَابٍ بَئِيسٍ بِمَا كَانُوا يَفْسُقُونَ ﴿١٦٥﴾﴾ الأعراف، واتە: جا کاتێك کە ئەوەیان لە بیرچوو کە پێی ئامۆژگاریی کرابوون، ئەوانەیان کە خەڵکیان لە خراپە قەدەغە دەکرد، دەربازمان کردن (دیارە هەموویان شەممەیان نەشکاندوە)، ئەوانی دیکەشمان بە عەزابێکی زۆر بە ئێش گرت، بە هۆی لاڕێ بوونیانەوە، ﴿فَلَمَّا عَتَوْا عَن مَّا نُهُوا عَنْهُ قُلْنَا لَهُمْ كُونُوا قِرَدَةً خَاسِئِينَ ﴿١٦٦﴾﴾ الأعراف، واتە: ئنجا دوای ئەوەی کە خۆیان بە زلگرت، لە دەستهەڵگرتن لەوەی کە لێی قەدەغە کرابوون، پێمان گوتن: ببنە مەیموونی ڕیسواکراو.

**مەسەلەی چوارەم:** دەربارەی ئەو بوونە مەیموونە، زانایان سێ ڕایان هەن:

١) هەندێکیان دەڵێن: هەر بە ڕواڵەتو بە جەستە بوونەتە مەیموون، بەڵام دوایی بڕاونەوە، کەواتە: بەڵام ئەوە کە (داروین) دەڵێ: مەیموون بۆتە ئینسان ! ئەوە وانیە، بەڵکو هەندێك لە ئینسانەکان کە پابەند نەبوون بە شەریعەتی خواوە، خوا کردوونی بە مەیموون.

٢) وە هەندێك دەڵێن: ئەو بوونە مەیموونە، شتێکی مەعنەوییە، واتە: سیفەتی مەیموونیان تێدا پەیدابووە، بۆ وێنە: مەیموون عادەتی وایە، کە فرتو فێڵ دەکات، وە لاسایی خەڵك دەکاتەوەو ...هتد، خوای پەروەردگاریش سیفەتی مەیموونی تێدا پەیداکردوون، کە بریتیە لە فرتو فێڵو حیلەو ساختەکاریی !

٣) هەندێکیش دەڵێن: هەردووکیانە، هەم لەڕووی مەعنەوییەوە بوونەتە مەیموونو عادەتو فیکرو ڕەفتاریان وەك هی مەیموون بووە، وە هەم لەڕووی جەستەو ڕواڵەتیشەوە چوونەتە سەر شکڵو شێوەی مەیموون.

بەڵام گرنگ ئەوەیە کە لە زۆربەی تەفسیرەکاندا دەڵێ: لە سێ ڕۆژان زیاتر نەژیاونو دوای ئەوە بنەبڕبوونو بڕاونەتەوە.

**مەسەلەی پێنجەم:** ئەو کێوەی کە خوا بەرزی کردەوە بەسەر وەچەی ئیسرائیلدا، بۆ ئەوە کە بیسەلمێنن پابەند دەبن بە تەوراتەوەو شەریعەتی خوا پیادە دەکەن، یەکێك بۆی هەیە بپرسێ: ئایا ئەوە لەگەڵ ئەو ئایەتەی کە دەفەرموێ: ﴿ ... لَآ إِكۡرَاهَ فِي ٱلدِّينِ ...﴿٢٥٦﴾ ﴾ البقرة، واتە: تۆبزیی کردن نیە لە دینداریيدا، تێکناگیرێ؟ لە وەڵامدا دەڵێین: نەخێر، چونکە کە دەفەرموێ: تۆبزییکردن نیە لە دیندارییدا یانی لەسەر ئەسڵی فەرزکردنی دین، وەك ئیمانو عەقیدە کە هەندێك لە زانایانی ئیسلام دەڵێن: ﴿ ... لَآ إِكۡرَاهَ فِي ٱلدِّينِ ...﴿٢٥٦﴾ ﴾ البقرة ئەو (نَفي)یە بە مانای (نَهي) نیە، بەڵکو هەر بە مانای نەفییە، هەڵبەتە ڕواڵەتەکەی هەر نەفییە، بەڵام هەندێك دەڵێن: ئەو نەفییە لێرەدا مەبەست

پێی نەهییە، بەلام بەشێکی دیکەیان دەلێن: هەر لەسەر ئەسلی مانای ڕواڵەتیی خۆیەتی‌و مەبەست پێی نەهی کردن نیە، واتە: کە خوا دەفەرموێ: لە دینداریی‌دا تۆبزیی کردن نیە، واتە: دینداریی تۆبزیی‌و زۆر لێکردنی تێدا نیە، نەك مەبەست ئەوەبێ، لە دینداریی‌دا زەبرو زۆر مەکەن! کەواتە: لە وەرگرتنی ئەسلی دینداریی‌دا کە ئیمان‌و عەقیدەکەیەتی، تۆبزیی کردن نەگونجاوەو نە دروستیشە، بەلام ئەوەی وەچەی ئیسرائیل کە تۆزێك زەخت‌و فشاریان لەسەر کراوەو هەڕەشەیان لێکراوە ئەوە بۆ پابەندییان بە شەریعەتەوە بووە، کە ئەوە لەگەڵ ئازادیی لە وەرگرتنی ئیمان‌و عەقیدەدا تێکناگیرێ، چونکە ئینسان ئازادە ئیمان‌و عەقیدە وەردەگرێ، یان وەرناگرێ، بەلام دوایی ئازاد نیە لەوەدا، کە ئایا پابەند دەبێت بەو شەریعەتەوە، کە لەو عەقیدەیە هەڵدەقوڵێ یان نا ؟ هەروەك لە شەریعەتی ئیسلامیشدا کەسێك کە دەڵێ مسوڵمانم، دەسەلاتی شەرعیی (دەوڵەت) ناچاریی دەکات کە پابەند بێت، بە ئەرکەکانی سەرشانیەوەو خۆی لە قەدەغەکراوەکان بپارێزێ، وە خۆی بپارێزێ لە دەستدرێژیی کردن، وە ئەگەر قەدەغەکراوەکان بشکێنی یان هەندێك لە واجبەکان بچوێنێ، بەتایبەت ئەوانەی کە پەیوەندییان بە مافەکانی خەڵکەوە هەیە، بۆ وێنە: زەکات نەدات، ئەوە دەسەلاتی شەرعیی بە زۆر ئەو یاسایانەی بەسەردا دەسەپێنێ، کە لەو عەقیدەیەوە هەڵدەقوڵن کە بە ئیختیاری خۆی هەڵیبژاردوە، بەلام ئەگەر کەسێك بڵێ: من مسوڵمان نیم، ئەوە تۆبزیی لێناکرێ.

**مەسەلەی شەشەم:** ئەو خەڵکەی کە لەو شارەدا بوون، کە لە نزیك دەریاکەوە بوو، وەك گوتمان: هەندێکیان شەممەیان شکاند، لە حاڵێکدا کە جوولەکە بوون‌و لەسەریان پێویست کرابوو لە شەممماندا ئیش نەکەن، جا خەڵکی شارەکە بوونە سێ دەستە:

١/ هەندێکیان سەرپێچییان کردو شەممەیان شکاندو لە ڕۆژی شەممەدا ڕاوی ماسییان کرد.

٢/ وە هەنـدێکیان نـەهییان کـرد لـەو ناشـەرعییو خراپەیـە کـە ڕوویـداوەو ئامۆژگاریی ئەوانەیـان کردو سـەرزەنشـتیان کردن کە شـەممەیان شکاند.

٣/ وە هەندێکیان بێ هەڵوێست بوون، بـەڵکو تەنانـەت گلەییشیان لەوانە کـرد، کە نەهییان لە مونکەر دەکرد، وەك خـوا فەرموویـەتی: ﴿وَإِذْ قَالَتْ أُمَّةٌ مِّنْهُمْ لِمَ تَعِظُونَ قَوْمًا ٱللَّهُ مُهْلِكُهُمْ أَوْ مُعَذِّبُهُمْ عَذَابًا شَدِيدًا ﴿١٦٤﴾﴾الأعـراف، واتـە: وە یادبکـەوە کـاتێك کۆمەڵێکـیان گوتیـان: (بەوانـەی کە ڕێگرییـان لـە خراپـە دەکرد) بۆچی نەهی لە کەسانێك دەکەن کە خـوا (لـە دنیـادا) دەیانفەوتێنێ یان (لە دوارۆژدا) زۆر بە توندیی سزایان دەدات؟ لێیـان بگـەڕێنو ئیهمالیـان بکەن، جا ئەوانـە کـە بەشـی سـێیەمی خەڵـکی شارەکە بـوون کەسانێکـی بـێ هەڵوێست بوون، خوای پەروەردگاریش باسـی دوو کۆمەڵەکـەی دیکە دەکات هەم ئەوانەی کـە خراپـەیان کـردوەو، هـەم ئەوانـەی کـە ڕێگرییـان لـە خراپـە کـردوە، وەك دەفـەرموێ: ﴿فَلَمَّا نَسُوا۟ مَا ذُكِّرُوا۟ بِهِۦٓ أَنجَيْنَا ٱلَّذِينَ يَنْهَوْنَ عَنِ ٱلسُّوٓءِ وَأَخَذْنَا ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ بِعَذَابٍۭ بَـِٔيسٍۭ بِمَا كَانُوا۟ يَفْسُقُونَ ﴿١٦٥﴾﴾ الأعـراف، وەك دەبینین خوا باسی سـەرەنجامی ئەوانـە دەکات کە نەهییـان لـە مونکەر کـردوە، وە باسـی ئەوانـەش دەکـات کـە شـەممەیان شـکاندوەو دەفـەرموێ: ئەوانـەی کە نەهییـان دەکـردو ئـەوانی دیکەیان قەدەغـە دەکـرد لـە خراپـەو سەرزەنشـتیان دەکردن، ئەوانمان دەرباز کـردو، ئەوانـەش کـە ستەمیان کـردو قەدەغەکەیان شـکاند، ئەوانەشمان زۆر بەتوندیی سـزادان، بـەڵام وەك گوتمـان باسـی کۆمـەڵی سـێیەم ناکـات، کـە بـێ هەڵوێـست بـوون ! جـا هەنـدێك لـە توێـژەرەوانی قورئـان دەڵـێن: وەك چـۆن ئەوانـە کەسانێکـی گـوێ پێنـەدەر (مُهمِل) بوون، خوای کـاربەجێش ئـەوانی ئیهمـال کـردوە، بـەڵام مـن وای بـۆ دەچم کە ئـەوان وەبەر سزا کـەوتبن، بۆچی؟ چونکە خـوا ﷻ لـە سـووڕەتی (الـمائدة)دا دەفـەرموێ: ﴿لُعِنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِنۢ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ عَلَىٰ لِسَانِ دَاوُۥدَ وَعِيسَى ٱبْنِ مَرْيَمَ ۚ ذَٰلِكَ بِمَا عَصَوا۟ وَّكَانُوا۟ يَعْتَدُونَ ﴿٧٨﴾﴾،

واتە: ئەوانەی کافربوون لە وەچەی ئیسرائیل لەسەر زمانی داوودو عیسای کوڕی مەریەم، لەعنەتیان لێکرا، ئەویش بەهۆی ئەوەوە کە سەرپێچییان کردو دەستدرێژییان کرد، دوایی دەفەرموێ: ﴿ كَانُواْ لَا يَتَنَاهَوْنَ عَن مُّنكَرٍ فَعَلُوهُۚ لَبِئۡسَ مَا كَانُواْ يَفۡعَلُونَ ﴿٧٩﴾ ﴾ المائدة، واتە: ئەوانە یەکدییان قەدەغە نەدەکرد، لە ناشەرعییەك کە لە نێوانیاندا دەکرا، بێگومان ئەوە خراپترین شت بوو دەیانکرد، کەواتە: ئەوانەش کە خەڵکیان قەدەغە نەکردوە، لەو کارە ناشەرعییانەی کە لەنێو کۆمەڵگادا کراون، وەبەر ئەو لەعنەتەی داوودو عیسا (صەڵاتو سەلامی خوایان لەسەر بێت) کەوتوونو بۆ هەڵوێستییەکەشیان بە خراپترین کارو ڕەفتار وەسف کراوە !!

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی چواردەیەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

لەم دەرسەماندا هەر لەخزمەت سووڕەتی (البقرة) داین‌و لە ئایەتەکانی ژمارە (٦٧ تا ٧٤) تەفسیر دەکەین، کە لەم هەشت (٨) ئایەتەدا خوا ﷻ بەسەرهاتی کوژرانی پیاوێکمان بۆ دەگێڕێتەوە لە نێو گەلی جوولەکەدا، کە کوژەرەکەی دیارنیە، جا کاتێك خزمەکانی دەچن بۆ لای مووسا ﷺ بە فەرمانی خوا پێیان دەڵێ: کە مانگایەك سەربڕن‌و ئەندامێکی ئەو مانگا سەربڕاوە لە جەنازەی ئەو کوژراوە بدەن، زیندوو دەبێتەوە، وە ناوی بکوژەکەی خۆیانیان پێ دەڵێ، ئەوە پوختەی بەسەرهاتەکەیە کە دوایی بە تەفصیل باسی دەکەین.

﴿ وَإِذْ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوْمِهِۦٓ إِنَّ ٱللَّهَ يَأْمُرُكُمْ أَن تَذْبَحُوا۟ بَقَرَةً ۖ قَالُوٓا۟ أَتَتَّخِذُنَا هُزُوًا ۖ قَالَ أَعُوذُ بِٱللَّهِ أَنْ أَكُونَ مِنَ ٱلْجَٰهِلِينَ ﴿٦٧﴾ قَالُوا۟ ٱدْعُ لَنَا رَبَّكَ يُبَيِّن لَّنَا مَا هِىَ ۚ قَالَ إِنَّهُۥ يَقُولُ إِنَّهَا بَقَرَةٌ لَّا فَارِضٌ وَلَا بِكْرٌ عَوَانٌۢ بَيْنَ ذَٰلِكَ ۖ فَٱفْعَلُوا۟ مَا تُؤْمَرُونَ ﴿٦٨﴾ قَالُوا۟ ٱدْعُ لَنَا رَبَّكَ يُبَيِّن لَّنَا مَا لَوْنُهَا ۚ قَالَ إِنَّهُۥ يَقُولُ إِنَّهَا بَقَرَةٌ صَفْرَآءُ فَاقِعٌ لَّوْنُهَا تَسُرُّ ٱلنَّٰظِرِينَ ﴿٦٩﴾ قَالُوا۟ ٱدْعُ لَنَا رَبَّكَ يُبَيِّن لَّنَا مَا هِىَ إِنَّ ٱلْبَقَرَ تَشَٰبَهَ عَلَيْنَا وَإِنَّآ إِن شَآءَ ٱللَّهُ لَمُهْتَدُونَ ﴿٧٠﴾ قَالَ إِنَّهُۥ يَقُولُ إِنَّهَا بَقَرَةٌ لَّا ذَلُولٌ تُثِيرُ ٱلْأَرْضَ وَلَا تَسْقِى ٱلْحَرْثَ مُسَلَّمَةٌ لَّا شِيَةَ فِيهَا ۚ قَالُوا۟ ٱلْـَٰٔنَ جِئْتَ بِٱلْحَقِّ ۚ فَذَبَحُوهَا وَمَا كَادُوا۟ يَفْعَلُونَ ﴿٧١﴾ وَإِذْ قَتَلْتُمْ نَفْسًا فَٱدَّٰرَْٰٔتُمْ فِيهَا ۖ وَٱللَّهُ مُخْرِجٌ مَّا كُنتُمْ تَكْتُمُونَ ﴿٧٢﴾ فَقُلْنَا ٱضْرِبُوهُ بِبَعْضِهَا ۚ كَذَٰلِكَ يُحْىِ ٱللَّهُ

ٱلۡمَوۡتَىٰ وَيُرِيكُمۡ ءَايَٰتِهِۦ لَعَلَّكُمۡ تَعۡقِلُونَ ﴿٧٣﴾ ثُمَّ قَسَتۡ قُلُوبُكُم مِّنۢ بَعۡدِ ذَٰلِكَ فَهِيَ كَٱلۡحِجَارَةِ أَوۡ أَشَدُّ قَسۡوَةٗۚ وَإِنَّ مِنَ ٱلۡحِجَارَةِ لَمَا يَتَفَجَّرُ مِنۡهُ ٱلۡأَنۡهَٰرُۚ وَإِنَّ مِنۡهَا لَمَا يَشَّقَّقُ فَيَخۡرُجُ مِنۡهُ ٱلۡمَآءُۚ وَإِنَّ مِنۡهَا لَمَا يَهۡبِطُ مِنۡ خَشۡيَةِ ٱللَّهِۗ وَمَا ٱللَّهُ بِغَٰفِلٍ عَمَّا تَعۡمَلُونَ ﴿٧٤﴾ ﴾

## مانای وشە بە وشەی ئایەتەکان

((وە یادبکەنەوە (ئەی وەچەی ئیسرائیل !) کاتێك مووسا بە گەلەکەی خۆی گوت: بێگومان خوا فەرمانتان پێدەکات کە مانگایەك سەربڕن، گوتیان: ئایا گاڵتەمان پێدەکەی؟ گوتی: پەنا بەخوا دەگرم کە لە نەفامان بم﴿٦٧﴾ گوتیان: داوامان بۆ لە پەروەردگارت بکە بۆمان ڕوون بکاتەوە ئەو مانگایە چۆنە؟ گوتی: ئەو دەفەرموێ: ئەو مانگایەکە نە پیرە، وە نە کەم تەمەنە، مام نێوەندییە، دەجا ئەوەی فەرمانتان پێکراوە، بیکەن﴿٦٨﴾ گوتیان: داوامان بۆ لە پەروەردگارت بکە، بۆمان ڕوون بکاتەوە، چ ڕەنگێکە؟ گوتی: ئەو دەفەرموێ: ئەو مانگایەکی زەردە، زەردێکی تۆخ کە تەماشاچییان دڵخۆش دەکات﴿٦٩﴾ گوتیان: داوامان بۆ لە پەروەردگارت بکە، بۆمان ڕوون بکاتەوە چۆن چۆنییە؟ چونکە مانگاکانمان[1] لێ تێکەڵ بوون (وە نازانین مەبەست کامیانە) وە ئێمە ئەگەر خوا بیەوێ، ڕێی ڕاستگرتوو دەبین﴿٧٠﴾ گوتی: ئەو دەفەرموێ: ئەو (مانگایە) مانگایەکە کە بە زەوی کێڵان و کشتوکاڵ ئاودان، ڕام و ملکەچ نەکراوە، بێ عەیبە، پەڵەو ڕەنگی (جیاوازی) تێدا نین، گوتیان: ئێستاکە هەقت هێنا، (ئیدی مانگاکەیان پەیداکردو) سەریان بڕی و نزیك بوو کارەکە نەکەن﴿٧١﴾ وە یاد بکەنەوە کاتێك کەسێکتان کوشتبوو، جا لەبارەیەوە کەوتبوونە مشتومڕەوە، هەرکەسە تۆمەتی کوشتنەکەی لە خۆی دوور دەخستەوە، خواش ئەوە هەر ئاشکرا دەکات کە دەیشارنەوە﴿٧٢﴾ ئنجا

---

١) چونکە وشەی (بَقَر) زانایان دەڵێن: (إسم جنس)ە، واتە: مانگایەکان یان ڕەشەوڵاخەکان بەگشتی بە نێرو مێ وە، بڕوانە (مختار الصّحاح) وشەی : بقر.

گوتمان بەشێكی مانگایەكە لەو مردووە بدەن (زیندوو دەبێتەوە)، ئاوا خوا مردووان زیندوو دەكاتەوە، وە نیشانەكانی خۆیتان پیشان دەدات بەڵكو بفامن ﴿٧٣﴾ پاشان دڵەكانتان لە دوای ئەوە، ڕەق و سەخت بوون، بەجۆرێك كە وەك بەرد وان، بەڵكو ڕەقتریشن، چونكە بەردی وا هەیە ڕووباری لێ دەتەقێتەوە، وە هی وا هەیە كە درز دەبات و لەت دەبێت و ئاوی لێ دێتە دەرێ، وە هی وا هەیە لە ترسی خوا دەكەوێتە خوارێ، وە خوا بێ ئاگانیە لەوەی كە دەیكەن ﴿٧٤﴾)).

## شیكردنەوەی هەندێك لە وشەكان

(**لِقَوْمِهِۦٓ**): (القَوْم: جَمَاعَة الرِّجَالِ دونَ النِسَاء. وفي عامَّةِ القُرآنِ أُرِيدُ بِهِ الرِّجالُ وَالنِّسَاءُ جَميعَاً)، واتە: (قَوْم) بە كۆمەڵی پیاوان دەگوترێ جیا لە ئافرەتان، بەڵام لە قورئاندا مەبەست پێی پیاوان و ئافرەتانە پێكەوە.

(**بَقَرَةً**): واتە: مانگا، لە ئەسڵدا لە (بَقَرَ الأرضَ، أي شَقَّ وَجَمع بَقَر: أَبْقُر) واتە: وشەی (بقرة) لە (بقَرَ الأرض)، واتە: زەوییەكەی لەت كرد، هاتووە كۆی (بَقَرْ)یش (أَبْقُر)ە، وە (بقرة) بە (بَقَرات) كۆدەكرێتەوە.

(**هُزُوًا**): كە بە: (هزواً)وە (هزوءاً) خوێندراوەتەوە (هُزء: مُزْحٌ في خُفْيَةٍ) واتە: (هُزءْ) بریتیە لە گاڵتە پێكردنێكی بە پەنهانیی، بەڵام من پێم وایە ئەگەر گوتبای: (مَزْحٌ مَعَ إهَانةٍ) باشتر بوو، چونكە (مِزاح)مان هەیە، واتە: گاڵتە لەگەڵكردن و سوحبەت، كە حەرام نیە، بەڵام (هُزء)، واتە: گاڵتە پێكردن، كە حەرامە، بەڵێ، قسەی خۆشكردن و سوحبەتكردن بەیەكەوە لە شەرعدا هەیە، وە پێغەمبەر ﷺ جاری وابووە قسەی خۆش و سوحبەتی كردوە، لەگەڵ هاوەڵاندا.

(**فَارِضٌ**): (الفَرْضُ: قَطْعُ الشَّيءِ الصَّلْبِ والتأثيرُ فِيهِ)، واتە: لە زمانی عارەبیدا (فَرَضَ) واتە: شتێكی ڕەقی لەتكردو كاری تێكرد، بەڵام (فارضٌ) لێرەدا، واتە: (المُسِنُّ مِنَ البَقَرِ لِكَونِهِ فارِضَاً للأرضِ، أي: قَاطِعَاً أو لأَنهُ فرِيضَةُ الزَكَاةِ)

ڕەشەوڵاخی بەتەمەن (مانگای بەتەمەن)، چونکە زەوی دەکێڵێ، یان چونکە زەکاتی تێدا فەرزە.

(**بِكْرٌ**): (أصْلُ الكَلِمَةَ هِيَ البُكْرَة الّتي هيَ أوَّل النَّهار)، واتە: لە ئەسڵدا وشەی (بِكْر) لە: (البُكْرَة) یانی سەرەتای ڕۆژ هاتوە، (وَمِن البَقَرَة، هي الّتى لَمْ تلِد) بەڵام (بِكْر) لە مانگادا ئەوەیە بەچکەی نەبووبێ، بە کوردی: نێنگوون.

(**عَوَانٌ**): (العَوَانُ: المُتَوَسِّطُ بَيْنَ الشَّيْئَيْنِ) واتە: (عَوان) بریتیە لەوەی لەنێوان دوو شت دابێ، کە لێرەدا مەبەست پێی مانگایەکە نە پیربێ و نە کەم تەمەن بێ، بەڵکو مام نێوەندیبێ.

(**صَفْرَآءُ**): (الصُّفْرَةُ: لَوْنٌ مِنَ الأَلْوَانِ التي بَيْنَ السَّوَادِ والبَيَاضِ، وهِيَ إلى السَّوَادِ أقْرَبُ) واتە: (صَفراء) (ڕەنگی زەرد)ە، کە ڕەنگێکە لەنێوانی ڕەنگی ڕەش و سپی دایە، بەڵام لە ڕەنگی ڕەش نزیکترە.

(**فَاقِعٌ**): لە زمانی عارەبیدا ئەگەر بیانەوێ هەندێك ڕەنگ بە تۆخیی بنوێنن سیفەتێکی بۆ زیاد دەکەن، وەك گوتراوە: (صفراء فاقع، أسوَد قائم، أحمرٌ قانٍ، أبيَضٌ ناصِعٌ ..)، یانی: زەردی تۆخ، ڕەشی تۆخ، سووری تۆخ، سپی سپی.

(**تَشَٰبَهَ**): (تَشابَهَ: أي أشْبِهَ بَعْضُها بَعْضاً)، واتە: هەندێکی بە هەندێکی دەچێ، یانی: لێمان تێکەڵ بووەو نازانین کامەیان مەبەستە، لەبەرئەوەی ڕەنگی زەردباو زۆربوون.

(**ذَلُولٌ**): (قِيلَ: ذَلَّتِ الدَّابَةُ بَعْدَ شِمَاسٍ ذِلاًّ، وَهيَ ذَلُولٌ أي: لَيْسَت صَعْبَة) واتە: وڵاخێك کە چەمووش بێ، دوای ئەوەی ڕامبێ و دەستەمۆبێ، بەوە دەگوترێ، واتە: مامەڵە لەگەڵ کردنی ئاسانەو زەحمەت و قورس نیە.

(**تُثِيرُ**): (أثارَ الغُبَارَ) یانی: تۆزو خۆڵی بڵاوکردەوە، دیارە زەویش کە کێڵرا تۆزو غوباری لێ هەڵدەستێ.

(مُسَلَّمَةٌ): (السَّلْمُ والسَّلاَمَةُ: التَّعَرِّي مِنَ الآفَاتِ الظَّاهِرَةِ وَالبَاطِنَةِ)، وشەی (سَلْمُ) و (سَلامة) واتە: سەلامەتیی و ساغیی و پاكیی لە عەیب و كەموكووڕیی ڕووالەتیی و پەنهانیی، وەك خوای تاك و پاك دەفەرموێ: ﴿ إِلَّا مَنْ أَتَى اللَّهَ بِقَلْبٍ سَلِيمٍ ﴿٨٩﴾ ﴾ الشعراء، واتە: مەگەر كەسێك بە دڵێكی ساغەوە هاتبێ (بەس ئەو كەسە سەرفرازە لە قیامەت). بۆیە عارەب بە بابای مار پێوەدراو (لَدیغ) دەڵێن: (سَلیم) سەلامەت، وەك گەشبینی.

(لَّا شِيَةَ): (شية: أصْلُهَا وشْيَةَ: لَونٌ مُغايِر)، واتە: ڕەنگی جیاواز، كە دەفەرموێ: ﴿لَّا شِيَةَ فِيهَا﴾، واتە: هیچ ڕەنگی جیاوازی تێدانییە، زەردێكی سەرتاپا زەردو تۆخە.

(فَادَّارَأْتُمْ): (الدَّرْءُ: المَيْلُ إلى أحَدِ الجَانِبَينِ، يُقالُ: دَرَأتُ عَنهُ: دَفَعْتُهُ عَن جانبِيهِ)، واتە: (دَرْأ) یانی: خواربوون بە یەكێك لە دوو لایەكاندا، وە دەگوترێ: (دَرَأتُ عَنهُ) یانی: لەملاولای دوورم خستەوە، كەواتە: (فادَّارءْتُم: تَدَافَعْتُم)، واتە: هەركامێكتان تۆمەتی كوشتنەكەی لە خۆی دوور دەخستەوەو بەرگریی لە خۆی دەكرد.

(قَسَتْ): (القَسْوَةُ: غِلَظُ القَلْبِ، وَأصْلُهُ مِن: حَجَرٍ قاسٍ)، واتە: (قَسْوَة) یانی: دڵڕەقیی، وە وشەی (قَسْوَة) لە ئەسڵدا لە بەردی سەخت و ڕەقەوە هاتوە.

(يَتَفَجَّرُ): (الفَجْرُ: شَقُّ الشَّيءِ شَقّاً وَاسِعاً، يُقالُ: فَجَرْتُهُ فَانْفَجَرَ، وَفَجَّرْتُهُ فَتَفَجَّر) واتە: (فَجْرُ) بریتییە لە لەتكردنی شتێك كە درزێكی فراوانی تێبكەوێ، وە دەگوترێ: (فَجَرْتُهُ فَانْفَجَرَ)، یانی: لەتم كردو لەت بوو، وە دەشگوترێ: (وَفَجَّرْتُهُ فَتَفَجَّر)، واتە: وە لێكمكردەوەو ئەویش لێكبۆوە.

(يَشَّقَّقُ): (الشَّقُّ: الخَرْمُ الوَاقِعُ فِي الشَّيءِ) واتە: (شَق) كەلێم و درزێكە لە شتێكدا پەیدادەبێ.

(**يَهْبِطُ**)؛ واتە شۆڕدەبێتەوە، دێتەخوار، کە لە (هُبُوط)ەوە هاتوە، (الهُبُوط: الإنحدَارُ عَلَى سَبِيلِ القَهْرِ كَهُبُوطِ الحَجَرِ)، واتە: شتێك کە بە تۆبزیی پاڵی پێوەبنێی بێتە خوار، وەك پاڵ پێوەنانی بەردو شۆڕبوونەوەی.

(**خَشْيَةِ**)؛ (الخَشْيَةُ: خَوْفٌ يَشُوبُهُ تَعظِيمٌ وَ أكثَرُ مَايَكُونُ ذَلِكَ عَنْ عِلْمٍ بِمَا يُخْشَى مِنهُ)، وشەی (الخَشْيَة) و (خَوْف) هەردووکیان بە مانای ترسە لە زمانی کوردەواریی خۆماندا، بەڵام زمانی عارەبی وردەکاریی زۆری تێدایە لە چاو زمانەکانی دیکە، (خَشْيَةُ) ترسێکە بە گەورەگرتنی لەگەڵ دابێ، وە بەزۆریی لە ئەنجامی ئەوەدا دەبێ، کە زانیاری دەبێ بە لێترساوەکە، بۆیە خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿...إِنَّمَا يَخْشَى اللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ الْعُلَمَاءُ...﴿٢٨﴾﴾ فاطر، واتە: بێگومان تەنیا بەندە زاناکان لە خوا دەترسێن، یانی: تەنیا ئەوان وەك پێویست ترس‌و سام‌و هەیبەتیان لێی هەیە.

## پێش مانای گشتی ئەم بەسەرهاتە دەگێڕینەوە

کە زۆربەی توێژەرەوان هێناویانە، بۆ نموونە: (الطَّبَري، إبْنُ كَثِير، الرّازِي، الشوكاني، القاسِمِي): {أَخْرَجَ عَبْدُ بْنُ حُمَيد وَابْنُ جَرِير وَابْنُ الْمُنذِر وَابْنُ أبِي حَاتِم وَالبَيْهَقِي فِي (السُنَن)، عَنْ عَبْدَة السلماني قَالَ: كَانَ رَجُلٌ مِن بَنِي إسرائيل عَقيماً لايولَدُ لَهُ وَكَانَ لهُ مَالٌ كثيرٌ، وَكَانَ ابنُ أخيهِ وَارِثهُ فقتلَهُ ثُمَّ احتمَلَهُ لَيلاً فوضعَهُ عَلَى بَاب رَجُلٍ مِنهُم، ثمَ أصبَح يَدّعيهِ عَلَيهم حَتى تسلّحوا وَركب بَعضهم إلى بَعضٍ فقال ذَوُوا الرأي مِنهم: عَلامَ يقتل بَعضكُم بَعضاً وَهذا رَسُول اللهِ فِيكُم؟ فأَتَوا مُوسى فذكروا ذَلِكَ لَهُ، فَقَالَ: ﴿...إِنَّ اللَّهَ يَأْمُرُكُمْ أَنْ تَذْبَحُوا بَقَرَةً...﴾ الآيَة، قَالَ: فلَو لَم يَعترضوا لَأَجزَأَتْ عَنهم أدنى بقرة ولَكِنَهم شّددوا فَشُدِّدَ عَلَيهم، حَتَّى انتهَوا إلى البَقَرَة التي أمِرُوا بذبحها، فوجدوها عِندَ رَجل لَيسَ لَهُ بقرة سِواها، فَقَالَ: وَاللهِ لا أنقصها

مِن ملأ جلدِها ذهباً فأخذوها بِملأ جلدِهَا ذهباً فذبحوها فَضُرِبَ بِبَعضِها، فَقَامَ: فَقَالُوا: مَنْ قتلك؟ فَقَالَ: هَذَا، لابن أخيهِ، ثُمَّ مَاتَ مَيِّتاً، فَلَمْ يُعْطَ مِن مَالِهِ شَيئاً وَلَمْ يُورَّثْ قَاتِلٌ بَعْدَهُ﴾، واتە: پیاوێك هەبوو لە وەچەی ئیسرائیل نەزۆك بوو (واتە: منداڵی نەبوو) وە موڵكو سامنێكی زۆری هەبوو، وە برازایەكی هەبوو كە هەر ئەو میراتی لێدەگرت، شەوێك كوشتیو جەنازەكەشی هەڵگرتو لە بەردەرگای پیاوێكی دانا، دوایی كە ڕۆژ بۆوە ئیددیعای كرد كە ئەو ماڵە، یاخود خەڵكی ئەو گەڕەكە مامیان كوشتوە، هەتا خەڵكی ئەو شوێنەی كە ئەو كابرایەی لێ كوژرابوو خۆیان چەكدار كردو سواری وڵاخ بوون بۆ یەكدی، بەڵام خاوەن عەقڵەكانیان گوتیان: باشە بۆ یەكدی بكوژین، ئەوە پێغەمبەی خوایە لە نێوماندا، ئیدی چوونە لای مووساو پێیانگوتو بۆیان باسكرد (دیارە دوای ئەوەی مووسا ﷺ گفتوگۆی لەگەڵ خوا ﷻ كردوە، خوا فەرمانی پێكردوە كە مانگایەك سەربڕن) ئیدی مووسا ﷺ پێی گوتن: خوا فەرمانتان پێدەكات مانگایەك سەربڕن، جا ئەگەر لە سەرەتاوە هەر مانگایەكیان ملگرتبایەو سەریان بڕیبایە وەبەردەكەوت، بەڵام ئەوان سەختگیرییان كردوەو لەسەریان سەخت بووە، هەتا گەیشتنە ئەو مانگایەی كە دەبێ سەریببڕن تەماشایان كرد، ئەو مانگایە بەو مواصەفاتە، تەنیا لای پیاوێك دەستدەكەوێ، كە هەر ئەو مانگایەشی هەیە، وە هەر ئەو مانگایەش هەبوو لەو شوێنە، ئەویش گوتی: وەڵڵاهی كەمتر لە پڕی پێستەكەی زێڕم بدەنێ نایفرۆشم، ئیدی بە ناچاریی پڕی پێستەكەی زێڕیان پێدا، ئنجا مانگاكەی پێدانو سەریانبڕی، ئنجا ئەندامێكی مانگاكەیان لە جەنازەكەدا، هەڵسایەوەو، لێیان پرسی: كێ تۆی كوشتوە؟ گوتی: فلان كەس ئاماژەی بۆ برازاكەی كرد، دوایی مردەوە، ئەوانیش كابرایان بێبەشكرد لە میراتەكەی، وە لەدوای ئەوەش هەركەسێك كەسێكی بكوشتبایە، مادام خزمی بووایە، میراتی نەدەدرایێ، وە لە هەندێك ڕیوایەتاندا هاتوە كە ئەو كوڕەیان لە تۆڵەدا كوشتۆتەوە.

## مانـــای گشـتی ئایەتەکــان

خوا ﷻ لە درێژەی سەرزەنشتکردنی بۆ جوولەکەکانی سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ، دێتە سەرباسی ئەم ڕووداوەو دەفەرموێ: ﴿ وَإِذْ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوْمِهِۦٓ إِنَّ ٱللَّهَ يَأْمُرُكُمْ أَن تَذْبَحُوا۟ بَقَرَةً ﴾، واتە: بیرخۆتانی بێننەوە، کاتێ مووسا ﷺ بە گەلەکەی خۆی گوت: خوا فەرمانتان پێدەکات مانگایەك سەرببڕن، {بە مەبەستی دۆزینەوەی بکوژی کابرای کوژراو، وە لێرەدا بەسەرهاتەکە پاش و پێش کراوە، کە ئێمە دوایی لە چەند مەسەلەیەکی گرنگدا حیکمەتەکەی ڕووندەکەینەوە، ئێستا ئایەتەکان هەر بەپێی ڕیزبەندیی خۆیان مانا دەکەین} ﴿ قَالُوٓا۟ أَتَتَّخِذُنَا هُزُوًا ﴾، گوتیان: ئایا گاڵتەمان پێدەکەی ! (لێرەدا دیارە لە هەمبانەی خۆیاندا گوێزیان ژماردوە، ئەوانە عادەتیان وابووە گاڵتە بەیەکدی بکەن، ئیدی وایانزانیوە پێغەمبەری خواش وایە) بۆیە مووسا ﷺ دەفەرموێ: ﴿ قَالَ أَعُوذُ بِٱللَّهِ أَنْ أَكُونَ مِنَ ٱلْجَٰهِلِينَ ﴾، پەنا بەخوا دەگرم کە لە نەفامان بم، واتە: خەڵکی نەفام گاڵتە بە خەڵکی دەکەن، بەڵام من نەفام نیم ﴿ قَالُوا۟ ٱدْعُ لَنَا رَبَّكَ يُبَيِّن لَّنَا مَا هِىَ ﴾، گوتیان: دەی مادام بە جیددیتیە بۆمان لە پەروەردگارت بپاڕێوە بۆمان ڕوونبکاتەوە: ئەو مانگایە چۆنە؟ دیارە ئەگەر ئیستفساریان نەکردبایەو قووڵیان نەکردبایەوە، هەرمانگایەکیان سەربڕی با تەواو دەبوو، بەڵام بەناچاریی کە ئەوان وردیان کردەوە، مووساش ﷺ لەگەڵیان چووە نێو وردەکارییەکانەوە ! ﴿ قَالَ إِنَّهُۥ يَقُولُ إِنَّهَا بَقَرَةٌ لَّا فَارِضٌ وَلَا بِكْرٌ عَوَانٌۢ بَيْنَ ذَٰلِكَ ۖ فَٱفْعَلُوا۟ مَا تُؤْمَرُونَ ﴾، فەرمووی: ئەو دەفەرموێ: ئەوە مانگایەکە نە تەمەنی زۆرە پیربێ، وە نە زۆریش کەم تەمەنە، لەو نێوانە دایە، (واتە: مانگایەکی مام نێوەندییە) دەجا ئەوەی فەرمانتان پێکراوە ئەنجامی بدەن، بەڵام دووبارە پرسیاریان کردەوە: ﴿ قَالُوا۟ ٱدْعُ لَنَا رَبَّكَ يُبَيِّن لَّنَا مَا لَوْنُهَا ﴾، گوتیان: بۆمان لە

پەروەردگارت بپرسە، بۆمان ڕوونبکاتەوە ڕەنگی چۆنە؟! دیارە پێش ئەوەی لە ڕەنگی بپرسن، هەر مانگایەك هەرجۆرێك بووایە: ڕەش، سپی، تێکەڵ، هەر چۆنێك بووایە هەر وەبەردەکەوت، بەڵام کە بۆخۆیان ئەو سەخت گیرییەیان لە خۆیان کرد خوا ﷻ بۆ سەرزەنشتکردنیان و، بۆ ئەوەی کە خەڵکی دیکەش لەوان عیبرەتگرتوو بێت، جۆرە ڕەنگێکی بۆ دیاریکردن کە ئەو ڕەنگە زۆر کەم بێت ﴿ قَالَ إِنَّهُۥ يَقُولُ إِنَّهَا بَقَرَةٌ صَفْرَآءُ فَاقِعٌ لَّوْنُهَا تَسُرُّ ٱلنَّـٰظِرِينَ ﴾، فەرمووی: ئەو دەفەرموێ: مانگایەکی ڕەنگ زەردە زەردێکی تۆخی جوان، کە هەرکەسێك تەماشای بکا هێندە زەردو جوانە پێی دڵخۆش دەبێت، دووبارە پرسیاریان کردەوە: ﴿ قَالُوا۟ ٱدْعُ لَنَا رَبَّكَ يُبَيِّن لَّنَا مَا هِىَ إِنَّ ٱلْبَقَرَ تَشَـٰبَهَ عَلَيْنَا وَإِنَّآ إِن شَآءَ ٱللَّهُ لَمُهْتَدُونَ ﴾، گوتیان: بۆمان لە پەروەردگارت بپاڕێوە بۆمان ڕوونبکاتەوە، چونکە مانگاکانمان لێ تێکەڵ بوون، (واتە: مانگای وا کە ڕەنگیان زەرد بێت زۆرن و نازانین مەبەست کامەیانە)، وە ئەگەر خوا بیەوێ ئێمە ڕێی ڕاستگرتوو دەبین، واتە: (إن شاء الله) هەر دەیدۆزینەوەو هەرچۆنێ بێ، فەرمانەکە جێبەجێ دەکەین، بۆجاری سێیەم مووسا وەڵامی دانەوە: ﴿ قَالَ إِنَّهُۥ يَقُولُ إِنَّهَا بَقَرَةٌ لَّا ذَلُولٌ تُثِيرُ ٱلْأَرْضَ وَلَا تَسْقِى ٱلْحَرْثَ مُسَلَّمَةٌ لَّا شِيَةَ فِيهَا ﴾، فەرمووی: ئەوە (خوا) دەفەرموێ: ئەو مانگایە ڕام و دەستەمۆ نەکراوە، بەوەی کە زەوی پێ کێڵرابێ و ئاویشی پێ نەکێشراوە (کە ئەوان عادەتیان وا بووە ناعوریان هەبووە، چونکە کاتی خۆی ناعوور هەبووە گا، یان مانگایان تێخستوەو بەدەوری بیرەکەدا سووڕاوە، دۆڵچەی پێوە بووە ئاو لە بیرەکە هاتۆتە دەرێ و، ئەو مانگایەش بەدەوری ئەو ناعوورەدا هەڵسووڕاوە)، وەبێ عەیبە هیچ عەیبی نین، وە هیچ ڕەنگی جیاوازی تێدانین (واتە: ڕەنگێکی زەردی هەیەو هیچ ڕەنگی دیکەی تێدانیە) ﴿ قَالُوا۟ ٱلْـَٔـٰنَ جِئْتَ بِٱلْحَقِّ ﴾، گوتیان: ئێستا هەقت بۆ هێناوین، (واتە: ئێستا شتەکەت بۆ ڕوونکردینەوە (دیارە ئەوە بێئەدەبییە لەگەڵ مووسادا کردوویانە) ئیدی سەرەنجام مانگایەکەیان دۆزییەوە بەو شێوەی کە باسمان کرد: ﴿ فَذَبَحُوهَا وَمَا كَادُوا۟ يَفْعَلُونَ ﴾، وە سەریانبڕی، (وە

ئەوەندە قۆرتو پێچیان تێخست) خەریك بوو ئەو فەرمانە جێبەجێ نەكەن! ئنجا خوا ﷻ دێتە سەر ئەسڵی بەسەرهاتەكە، كە بۆچی مووسا پێی گوتن: مانگاكە سەرببڕن؟ ﴿ وَإِذْ قَتَلْتُمْ نَفْسًا فَادَّارَءْتُمْ فِيهَا ﴾، واتە: وە یادبكەنەوە كاتێك نەفەرێكتان كوشتو تێیدا كەوتنە كێشەوەو هەركامێكتان تۆمەتەكەتان لە خۆتان دووردەخستەوە، هەندێكیش ﴿ فَادَّارَءْتُمْ فِيهَا ﴾، بە (فاختلفتم فیها) لێكدەدەنەوە واتە: تێداكەوتنە ڕاجیایی‌و كێشەوە ﴿ وَٱللَّهُ مُخْرِجٌ مَّا كُنتُمْ تَكْتُمُونَ ﴾، بەڵام خوا ئاشكرای دەكات ئەوەی كە ئێوە دەتانشاردەوە، واتە: ئەوەی كە دەستی هەبوو لە كوشتنیدا، خوا ئاشكرای دەكات ﴿ فَقُلْنَا ٱضْرِبُوهُ بِبَعْضِهَا ﴾، پێمانگوتن: بە هەندێك لەو مانگایە لەو جەنازەیە بدەن، واتە: ئەندامێكی ئەو مانگایە لەو جەنازەیە بدەن زیندوو دەبێتەوە. ئیدی ئەندامێكی مانگاكەیان لە جەنازەكەدا زیندوو بۆوە، جا وەك باسمان كرد، لێیان پرسی: كێ تۆی كوشت گوتی: فلان كەس، دوایی دووبارە مردەوە، خوا دەفەرموێ: ﴿ كَذَٰلِكَ يُحْيِ ٱللَّهُ ٱلْمَوْتَىٰ وَيُرِيكُمْ ءَايَٰتِهِۦ لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ﴾، ئاوا خوا مردووان زیندوو دەكاتەوەو نیشانەكانی خۆی پێشانی ئێوە دەدا، بەڵكو بفامن، ئنجا خوا ﷻ بە سەرزەنشتكردنەوە بە جوولەكەكان دەفەرموێ: ﴿ ثُمَّ قَسَتْ قُلُوبُكُم مِّنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ ﴾، ئنجا دوای ئەوە دڵتان ڕەقبووو سەخت بوو ﴿ فَهِىَ كَٱلْحِجَارَةِ أَوْ أَشَدُّ قَسْوَةً ﴾، كە وەك بەرد وایە، یاخود لە بەردیش سەختترە، واتە: ئەوەتان كە دڵی كەمتر ڕەقە وەك بەرد وایە، بەڵام هەیە لە بەردیش سەختترە، وەك ئاسن یان وەك پۆڵا وایە ﴿ وَإِنَّ مِنَ ٱلْحِجَارَةِ لَمَا يَتَفَجَّرُ مِنْهُ ٱلْأَنْهَٰرُ ﴾، ئنجا خوا ڕوونی دەكاتەوە كە بۆچی دڵیان لە بەرد ڕەقترە دەفەرموێ: چونكە بەردی وا هەیە كانیی‌و سەرچاوەی لێدەتەقێتەوە دوایی ڕووبار پێكدەهێنێ ﴿ وَإِنَّ مِنْهَا لَمَا يَشَّقَّقُ فَيَخْرُجُ مِنْهُ ٱلْمَآءُ ﴾، وە هەیانە كە درز دەباو كەلێنی تێدەكەوێ‌و ئاوی لێ دێتەدەرێ ﴿ وَإِنَّ مِنْهَا لَمَا يَهْبِطُ مِنْ خَشْيَةِ ٱللَّهِ ﴾، وە

هەشیانە لە ترسی خوا لە بەرزاییەوە خلۆر دەبێتەوەو دەکەوێتە خوار ﴿وَمَا ٱللَّهُ بِغَٰفِلٍ عَمَّا تَعۡمَلُونَ﴾، وە بێگومان خوا بێ ئاگانیە لەوەی کە ئێوە ئەنجامی دەدەن. هەڵبەتە کاتێك (چەند مەسەلەیەکی گرنگ) دەخەینەڕوو، زیاتر ماناو مەبەستی ئایەتەکانمان بۆ ڕۆشن دەبێتەوە.

## چەند مەسەلەیەکی گرنگ

**مەسەلەی یەکەم:** حیکمەتی دارشتنی ئەم بەسەرهاتە بەو جۆرە کە پاش‌و پێشی تێدایە، دەبێت چی بێت؟ چونکە بەسەرهاتەکە لەو شوێنەوە دەست پێ دەکات، کە دەفەرموێ: ﴿وَإِذۡ قَتَلۡتُمۡ نَفۡسٗا فَٱدَّٰرَٰٔتُمۡ فِيهَا﴾، کاتێك یەکێکتان کوشت‌و تێیدا کەوتنە کێشەو مشت‌ومڕەوە، واتە: کە دوایی مووسا فەرموویەتی: مانگایەك سەربڕن، سەربڕینی مانگایەکە بۆ دۆزینەوەی بکوژی کابرای کوژراو بووە، ئەدی بۆچی خوا ﷻ سەربڕینیی مانگاکەی پێشخستوە، وە باسی کوژرانی کابرای دواخستوە؟ توێژەرەوانی قورئان زۆریان لێکۆڵیوەتەوە حیکمەتی ئەوە چییە:

١ – هەندێکیان گوتوویانە: مەبەست تەشویق‌و سەرنج ڕاکێشانی خوێنەرەو بیسەرە کە یەکسەر ببیستێ: مووسا ﷺ بە گەلەکەی خۆی دەڵێ مانگایەك سەرببڕن ! ئەوە سەرنجی ڕادەکێشێ‌و هانی دەداو پاڵی پێوە دەنێ، بزانێ ئەو مانگایە بۆ دەبێ سەرببڕێ؟ دەبێ حیکمەت چی بێت ؟

٢ – هەندێکی دیکە گوتوویانە: بەم شێوەیە کە ئاوا دارێژراوە، بۆتە دوو بەسەرهات، بەسەرهاتێکیان ئەوەیە کە مووسا ﷺ بە گەلەکەی دەڵێ: مانگایەك سەرببڕن، خوا بەوە فەرمانتان پێدەکات، بەسەرهاتی دووەمیان ئەوەیە کە کەسێك کوژراوەو تێیدا کەوتوونەتە کێشەو مشت‌ومڕەوە، کە بکوژی ئەو کوژراوە چۆن بدۆزنەوە؟ وەك گوترا ئەو بەسەرهاتە بەو شێوەیە کراوە بە دوو بەسەرهات، بەڵام ئەگەر هاتباو پێشێ باسی کوشتنی کابرا کرابا، دوایی باسی سەربڕانی مانگاکە کرابا، دەبووە یەك بەسەرهات،

بەهەرحاڵ هەردوو تەحلیلەكان بەجێن، ڕاستە بەو شێوە بووە بە دوو بەسەرهات كە بەیەكەوە پەیوەستن، وە ڕاستە كە یەكسەر ئایەتەكانیش وا دەست پێدەكەن مووسا ﷺ بە گەلەكەی خۆی گوت: خوا دەفەرموێ مانگایەك سەربڕن، ئارەزووی ئینسان دەجووڵێنێو تەشویقی دەكات، بزانێ داخۆ ئەو مانگایە بۆچی دەبێ سەر ببڕدرێ؟ مووسا ﷺ ئەو فەرمانە بۆچی بە گەلەكەی دەكات ؟!

٣- وە منیش وای تێدەگەم حیكمەتێكیشی ئەوە بێت، كە خوا ﷻ پێشانی ئۆممەتی ئیسلامیی دەدات، ئەگەر پێغەمبەری ئێوە ﷺ شتێكی زۆر سەرسوڕهێنەریشی پێگوتن، وەك ئەوەی كە مووسا ﷺ بە گەلەكەی خۆی گوتوە، كە مانگا سەربڕن، دیارە مووسا كە پێی گوتوون مانگا سەربڕن! ئەو شتە پێشەكی هەبووە، بەڵام ئەگەر پێغەمبەری ئێوە ئەی مسوڵمانەكان! بەبێ پێشەكییش شتێكی پێگوتن كە زۆر لاتان سەیرو عەجایب بوو، دیسان پێویستە یەكسەر جێبەجێی بكەن، مادام دڵنیان ئەوە پێغەمبەری خوایە ﷺ، وە دڵنیانو پشت ئەستوورن كە پێغەمبەری خوا، هیچ شتێكی بێ حیكمەتو سوود ناڵێ، دەبێ یەكسەر ئەو فەرمانەی كە پێتان دەكا، چ پێغەمبەری خوایە ﷺ، چ هەركەسێك كە جێنشینی پێغەمبەری خوایە با فەرمانەكە زۆر نەچێتە عەقڵیشەوە، مادام ناشەرعیی نەبێتو لەگەڵ شەرع تێك نەگیرێ، پێویستە جێبەجێ بكرێ، چونكە مەرج نیە هەمیشە خەڵك لە حیكمەتو نهێنییەكانی ئەو فەرمانانە بگا، كە لە قیادەوە بۆی دێن دیارە بە مەرجێك یەكسەر لەگەڵ شەرع تێك نەگیرێ، چونكە {(لاَطَاعَةَ لِمخلوقٍ في مَعصيَةِ الخَالق) (رَوَاهُ أَحْمَد برقم: (٢٠٦٧٢)، وَالحَاكِمُ برقم: (٥٨٧٠)، وَقَالَ: صَحيح الإسناد، وَالطَّبَراني برقم: (٣٦٧)، عَنْ عِمران والحكم بن عمرو الغفاري، وَصَحَّحَهُ الألباني في (السلسلة الصحيحة) برقم: (١٧٩)}، واتە: گوێڕایەڵیكردنی دروستكراو ناكرێ، لە شتێكدا كە سەرپێچیی بەدیهێنەر بێ.

**مەسەلەی دووەم:** گەلی مووسا بە مووسا ﷺ دەڵێن: ﴿ أَتَتَّخِذُنَا هُزُوًا ﴾ ئایا گاڵتەمان پێ دەکەی ؟ دیارە (هـزواً) لێرەدا چاوگ (مَـصْدَر)ە، واتە: گاڵتەکردن، کە مەبەستیان ئەوەیە ئایا دەمانکەی بەجێی گاڵتە کردن؟ یاخود چاوگ (مَصْدَر)ە، بەڵام مەبەست پێی (مَفْعُول بِهِ)یە واتە: ئایا دەمانکەی بە گاڵتە پێکراو؟! لێرەدا گەلی مووسا ﷺ، کە ئەوە بە مووسا ﷺ، دەڵێن: لەڕاستیدا لە هەمبانەی خۆیاندا گوێز دەژمێرن‌و (قِیاسُ النَّفس) دەکەن‌و مووسا قیاس دەکەنە سەر خۆیان، چونکە بۆخۆیان عادەتیان وابووە گاڵتە بە یەکدی بکەن، بەڵێ پێغەمبەران گاڵتەیان لەگەڵ خەڵك کردوە، بەڵام هەرگیز گاڵتەیان بە خەڵك نەکردوە، گاڵتە لەگەڵ کردن واتە: قسەی خۆش‌و سوحبەت، بەڵام گاڵتەکردن بە خەڵك، ئەوەیە کە پێیان ڕابوێری، ئەوە قەت عادەتی پێغەمبەران نەبووە (علیهم الصلاة والسلام) وە گاڵتە پێکردن‌و گاڵتە لەگەڵ کردنیش لەیەك جیان، (الشوكاني) لە تەفسیری (فتح القدير)دا هێناویەتی، وە (القُرطُبي)یش لە (الجامع لإحكام القُرآن)دا هێناویەتی دەڵێ: ((یەکێ لە قازییەکان، قازییەکی ناوداری مسوڵمانان، کابرایەك هاتە لای، لێی پرسی گوتی: ئەو عەبایەی کە لەبەرتدایە لە تووکی بەرانە، یاخود لە تووکی مەڕە ؟ کابراش گوتی: جەنابی قازی گاڵتەم پێ مەکەو لە نەزانان مەبە! قازییەکەش گوتی: نا گاڵتەت پێناکەم، گاڵتەت لەگەڵ دەکەم !! )).

**مەسەلەی سێیەم:** مووسا ﷺ دەفەرموێ: ﴿ قَالَ أَعُوذُ بِاللَّهِ أَنْ أَكُونَ مِنَ الْجَاهِلِينَ ﴾، پەنا دەگرم بە خوا کە لە نەفامان بم، یانی چی؟ ئەوە چەند شتێکی لێوەردەگیرێ:

**یەکەم/** بەبێ پەنا بردنە بەر خواو بەبێ تەوفیقی خوا، ئینسان نەفامیی لێ دوور ناکەوێتەوە، ئەگەر بتەوێ نەفام نەبی‌و وەك جاهیلان ڕەفتارنەکەی، دەبێ پەنا بەری بۆ خواو پشت بە خوا ببەستی، خوا تەوفیقت بدات.

**دووەم/** ئەوەش دەگەیەنێ کە گاڵتە بەخەڵك کردن عادەتێکی نەفامانەیە.

**سێیەم/** ئەوەش دەگەیەنێ کە نەفامیی تەنها نەزانین نیە، بەڵکو ڕەفتارو هەڵسوکەوتی پێچەوانەی ئەدەبو زەوقو سەلیقەو عەقڵیش، هەر نەفامییە، واتە: نەفامیی تەنیا حاڵەتێکی عیلمییو تیۆریی (نظري) بەخۆوە ناگرێ، بەڵکو جاری وا هەیە حاڵەتێکی کردەییو ڕەفتاریی (سلوكي)یش بەخۆوە دەگرێ.

**مەسەلەی چوارەم:** ئەگەر سەرنج بدرێ هەموو جارێك وەچەی ئیسرائیل بە مووسا دەڵێن چی؟ دەڵێن: ﴿ ٱدۡعُ لَنَا رَبَّكَ ﴾، بۆمان لە پەروەردگارت بپاڕێوە: هەڵبەتە ئەوە جۆرێك لە کەم سەلیقەیی تێدایە بۆ ئەوان، چونکە خوا پەروەردگاری هەموو لایەکیانە، خۆ هەر پەروەردگاری مووسا نیە، دەبوو بڵێن: (أدع لنا ربنا) بۆمان لە پەروەردگارمان بپاڕێوە، چونکە وەك چۆن پەروەردگاری مووسایە، پەروەردگاری ئەوانیشە، بەڵام ئەوە جۆرێك لە کەم ئەدەبیو کەم سەلیقەیی تێدایە، وەك بیانەوێ بڵێن: مووسا ئەو پەروەردگارە هەر هی تۆیە !

**مەسەلەی پێنجەم:** کاتێك جوولەکەکان بۆ یەکەم جار دەڵێن: مووسا داوامان بۆ لە پەروەردگارت بکە کە ئایا ئەو مانگایە چۆنە؟ یەکسەر پێیان دەڵێ: ﴿ إِنَّهُۥ يَقُولُ إِنَّهَا بَقَرَةٞ لَّا فَارِضٞ وَلَا بِكۡرٌ عَوَانُۢ بَيۡنَ ذَٰلِكَۖ فَٱفۡعَلُواْ مَا تُؤۡمَرُونَ ﴾، واتە: ئەو (خوا) دەفەرموێ: نە مانگایەکی پیرو بەساڵداچوو پەککەوتەیەو، نە ساواشە، لەو نێوانەدایە، (دوایی یەکسەر پێیان دەڵێ:) ئەوەی فەرمانتان پێکراوە ئەنجامی بدەن، واتە: هێندە سەرەخەریی مەکەنو هەڵیمەکۆڵنو هێندە وردیی مەکەنەوە، دوایی لەسەرتان بەزەحمەت بێ، جا لێرەدا با سەرنج بدەین! سووڕەتی (البقرة) کە بەم بەسەرهاتەوە ناونراوە لەڕاستیدا ئەوە گەورەترین دەرسی تێدایە بۆ ئوممەتی پێغەمبەر ﷺ، دەرسەکە چییە؟ ئەوەیە کە وەختێك فەرمانێکی شەرع ئاڕاستەی مسوڵمانان دەکرێ، پێویستە یەکسەر جێبەجێی بکەنو زۆر هەڵێنەکۆڵنو لقو پۆپی زۆر لێنەکەنەوەو، زۆر لێکی

نەکێشنەوە، ئەوە دەبێت چۆنبێت و چی لێبکەین؟ سەرەنجام خۆیان عاسێ بکەن، وەك خوای زاناو توانا دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَسۡـَٔلُواْ عَنۡ أَشۡيَآءَ إِن تُبۡدَ لَكُمۡ تَسُؤۡكُمۡ وَإِن تَسۡـَٔلُواْ عَنۡهَا حِينَ يُنَزَّلُ ٱلۡقُرۡءَانُ تُبۡدَ لَكُمۡ ... ﴿١٠١﴾ ﴾ المائدة، واتە: ئەی بڕوادارینە! (ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە) لە هەندێك شت مەپرسن كە ئەگەر بۆتان دەربكەوێ، بۆتان خراپ بێت، وەچەی ئیسرائیل بۆیان دەركەوت بۆیان خراپ بوو، چونكە هەر زیاتر مەرجەكانیان لەسەر قورس بوو، هەتا وای لێهات یەك مانگا لەو جۆرە هەبێ و بە پڕی پێستەكەی زێڕ بیكڕن، دیارە ئەگەر هێندەیان لێ نەكۆڵیبایەوە، هەر مانگایەكیان لەو گۆڕە هێنابایە، ئیشەكەیان پێكدەهات، جا خوای پەنهانزان دەفەرموێ: لە هەندێك شت پرسیار مەكەن، ئەگەر بۆتان دەربكەوێ، لێی تووشی زیان بن، وە ئەگەر كاتێ قورئان دێتە خوارێ بپرسن بۆتان ڕوون دەبێتەوە، دوایی هەر لە سووڕەتی (المائدة)دا دەفەرموێ: ﴿ قَدۡ سَأَلَهَا قَوۡمٞ مِّن قَبۡلِكُمۡ ثُمَّ أَصۡبَحُواْ بِهَا كَٰفِرِينَ ﴿١٠٢﴾ ﴾، واتە: لەپێش ئێوەدا كەسانێك زۆر پرسیاریان كرد، دوایی ئەوە سەری كێشا بۆ ئەوە كە سەریان لە بێبڕواییەوە دەرچێ.

پێغەمبەر ﷺ لە فەرمایشتێكدا فەرموویەتی: {(مَا نَهَيْتُكُمْ عَنْهُ فَاجْتَنِبُوهُ وَمَا أَمَرْتُكُمْ بِهِ فَافْعَلُوا مِنْهُ مَا اسْتَطَعْتُمْ، فَإِنَّمَا أَهْلَكَ الَّذِينَ مِنْ قَبْلِكُمْ كَثْرَةُ مَسَائِلِهِمْ وَاخْتِلَافُهُمْ عَلَى أَنْبِيَائِهِمْ) (رَوَاهُ مُسْلِم برقم: (٦٠٦٦)، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه}، واتە: هەر شتێكم لێ قەدەغە كردن خۆتانی لێ دوور بگرن، وە هەرشتێك فەرمانم پێكردن، بەپێی توانا ئەنجامی بدەن، چونكە ئەوانەی پێش ئێوە بەوە فەوتان، زۆر پرسیاریان لە پێغەمبەرانیان دەكرد، وە زۆریان لەگەڵ دەكەوتنە ڕاجیایی و مشتومڕەوە، ئۆممەتی ڕێكوپێك ئەوەیە كە باوەڕو متمانەی بە سەرۆك و سەركردایەتی خۆی هەبێ و وەختێك شتێكی پێ دەڵێ، مادام پێچەوانەی شەرع وعەقڵ نەبێت، یەكسەر جێبەجێی بكات، نەك زۆری لەگەڵ بێنێ و بەرێ و، لێی بكۆڵێتەوەو وردی بكاتەوە، كە جاری واهەیە

هەندێك فەرمانو كار هەن، ئەگەر زۆرت لێكۆڵییەوە، هەرجێبەجێ ناكرێ، یاخود وەختەكەی بەسەر دەچێت! هەروەها پێغەمبەر ﷺ لە سیاقی فەرمایشتێكدا فەرموویەتی: {(... وَيَكْرَهُ لَكُمْ ثَلاَثاً: قِيلَ وَقَالَ، وَكَثْرَةَ السُّؤَالِ، وَإِضَاعَةَ الـمَالِ) (رَوَاهُ مُسْلِم برقم: (٤٤٥٦)، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه}، واتە: (وە خوا) سێ شتی ئێوەی پێناخۆشە: (شوێنكەوتنی) گوتراو گوتی (واتە: قسەی خەڵك وا گوتراو فڵانە كەس وای گوت)، وە ماڵ بە زایەدانو، زۆر پرسیاركردن.

**مەسەلەی شەشەم:** ئەوەیە كە وەچەی بەنی ئیسرائیل لەگەڵ كەموكوورییەكانیشیاندا، بەڵام بەدڵنیایی یەوە سیفەتی باشیشیان هەبوو ون، وە خوا تعالى سەرزەنشتیان دەكات لەسەر سیفەتە خراپەكانیان، بەڵام لەسەر سیفەتە چاكەكانیان مەدحیان دەكات، بۆ وێنە، دەفەرموێ: ﴿وَأَنِّي فَضَّلْتُكُمْ عَلَى ٱلْعَالَمِينَ﴾، واتە: وە من لەسەر هەموو جیهانییان هەڵمبژاردوون، كەواتە: دیارە كۆمەڵێ سیفەتی باشیشیان هەبوون، ئەوەتا لەگەڵ ئەو سەرەخەریی و وردكردنەوەی ئەو فەرمانەشدا، دوایی دەڵێن: ﴿وَإِنَّآ إِن شَآءَ ٱللَّهُ لَمُهْتَدُونَ﴾، وە ئێمە ئەگەر خوا بیەوێ ڕێی ڕاست دەگرین، واتە: سەرەنجام ئەو فەرمانە هەر جێبەجێ دەكەین، شتەكەیان گێڕاوەتەوە بۆ ویستی خوا، لە هەندێك شوێنەوار (أثر)دا هاتوە، كە ئەگەر نەیانگوتبایە: (إن شاء الله) هەرگیز ئەو فەرمانەیان بۆ جێبەجێ نەدەكرا، بەڵام لە بەرەكەتی ئەوەی شتەكەیان بەستۆتەوە بە ویستی خواوە، هەرچەندە لە سەرەتاوە، كارەكەیان لە خۆیان بەزەحمەت خستوە، بەڵام سەرەنجام خوا وایكردوە، كە بتوانن ئەو فەرمانە جێبەجێ بكەن.

**مەسەلەی حەوتەم:** كە لەم ئایەتانەو لەم بەسەرهاتەدا دێتە دەستمان، مەسەلەیەكی وردە، ئەویش ئەوەیە كە ئەگەر تەماشا بكەین ئەو مانگایە چەند مەرجێكی تێدا بووە:

**یەکەم/** سەلامەتو بێ کەموکووڕیی بووە: ﴿ مُسَلَّمَةٌ ﴾.

**دووەم/** یەکڕەنگ بووەو ڕەنگی جیاوازی تێدانەبووە: ﴿ لَّا شِيَةَ فِيهَا ﴾.

**سێیەم/** دەستەمۆ نەکراوەو ملکەچ نەکراوەو، نەخراوەتە ژێر نیری زەوی کێڵانو ئاو پێهەڵێنجانو ئاو پێ لە بیرکێشان ﴿ لَّا ذَلُولٌ تُثِيرُ ٱلْأَرْضَ وَلَا تَسْقِى ٱلْحَرْثَ ﴾.

ئەو جۆرە مانگایە بەکەڵکی ئەوە هاتوە ئەندامێکی لەو جەنازەیە بدرێو خوا زیندووی بکاتەوە، کەواتە:

**أ)** وادیتە بەرچاو کەسانێکیش دەتوانن ڕووحی ئیسلامو ئیمان بەبەرخۆیاندا بکەنەوە، کە بەڕاستی کەسانێکی یەکڕەنگبن ﴿ صِبْغَةَ ٱللَّهِ وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ ٱللَّهِ صِبْغَةً وَنَحْنُ لَهُۥ عَـٰبِدُونَ ﴿١٣٨﴾ ﴾ البقرة، یەکڕەنگ بنو سێ چوار ڕەنگان تێکەڵ نەکەنو، مسوڵمانو ئیماندارای ڕاستو ساغ بن!

**ب)** کەموکووڕیی‌و عەیب‌وعاریان نەبێت، کە خەڵك لە عەیب‌وعارو کەموکووڕییەکانیان بسەڵمێتەوەو، دینەکەشی بەهۆی وانەوە لەبەرچاو بکەوێ! : ﴿ لَّا شِيَةَ فِيهَا ﴾.

**ج)** ڕامو دەستەمۆی هیچ کەس نەبن وابەستەو دابەستەی هیچ کەس نەبن، بەس بەندەی خوابنو سەر بە خوابنو بەندەی ئەموئەو نەبن ! : ﴿ لَّا ذَلُولٌ تُثِيرُ ٱلْأَرْضَ وَلَا تَسْقِى ٱلْحَرْثَ ﴾، کەسانێکی ئاوا دەتوانن کۆمەڵگای خۆیان زیندوو بکەنەوە !

**مەسەلەی هەشتەم:** بۆچی خوا ﷻ لەنێو ئەو هەموو ئاژەڵانەدا مانگا دیاریدەکات، کە وەچەی ئیسرائیل سەری ببڕنو ئەندامێکی لە جەنازەکە بدەنو زیندووببێتەوە؟ واپێدەچێ بۆ ئەوەبێ چونکە ئەوانە کاتی خۆی گۆلکیان پەرستوە، خوای کاربەجێ ئامۆژگارییان دەکاو سەرزەنشتیان

دەكات، كە ئەو گۆلكەی ئێوە دەتانپەرست، لە مانگایەكی ئاوا بوو، گۆلكێك لە مانگا پەیدابێت، چۆن دەبێ بكرێتە پەرستراوو بەندایەتیی بۆ بكرێ؟ بۆ ئەوەی بەیەكجارەكی خۆشەویستی گۆلكیان لەدڵدا دابڕنێ، چونكە خوا ﷻ وەك لە ئایەتەكانی دیكەدا دەیگەینێ، دەفەرموێ: ﴿ وَأُشْرِبُواْ فِي قُلُوبِهِمُ ٱلْعِجْلَ بِكُفْرِهِمْ ﴾، واتە: خۆشەویستی گۆلكیان پێ خورابۆوە بەهۆی بێبڕواییانەوە، واتە: وەك دەرمانێك چۆن بەگەروویان دادەكرێ، ئاوا وەك بڵێی ئیرادەیان لەدەست دابێت، خۆشەویستی گۆلكیان چوو بووە دڵ، جا خوا ﷻ بەو مانگا سەربڕینە، ویستوویەتی یەكجاریی لیتەو لاڵو شوێنەوارو ڕەگو ریشەی ئەو گۆلك پەرستییە، لە دڵو دەروونیان بێنێتە دەرێ.

**مەسەلەی نۆیەم:** كە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَٱللَّهُ مُخْرِجٌ مَّا كُنتُمْ تَكْتُمُونَ ﴾، واتە: خوا ئەوەی ئێوە دەیشارنەوە هەر دەریدێنێو ئاشكرای دەكاو كەشفی دەكا، كە بەڕاستی ئەوە سوننەتێكی خوایەو هەرشتێك خەڵك بیشارنەوە خێربێ یان شەڕ، خوا هەر وەدەریدەخا، چ لە دنیادا، چ لە دوارۆژدا، وەك پێغەمبەر ﷺ لە فەرمایشتێكدا فەرموویەتی: {(لَو أنَّ رَجُلاً عَمِلَ عَمَلاً في صَخْرَةٍ صَمّاء لاَ بَابَ لَهُ ولاَكُوَّة، خَرَجَ عَمَلُهُ إلى النَّاسِ كَائِنًا مَا كَانَ) (رَوَاهُ أَحْمَد برقم: (١١٢٤٦)، وَالحَاكِمُ برقم: (٧٨٧٧)، عَنْ أَبي سَعِيدِ الخُدرِيّ رضي الله عنه، وَصَحَّحَهُ، ووافقهُ الذهبي في (التلخيص))}، واتە: ئەگەر پیاوێك كردەوەیەك بكات لەنێو بەردێكی ڕەقدا، كە نە دەرگای هەبێتو نەتاقەو پەنجەرەی هەبێ، كردەوەكەی دێتە دەرێ بۆ خەڵكی، كردەوەكەی هەرچییەك بێت، كەواتە: ئینسان پێی وانەبێت كە ئەو خێرەی دەیكات، یاخود ئەو خراپەی دەیكات، پەنهان دەبێ، بەڵكو خوا بە جۆرێك لە جۆرەكان هەر بۆ خەڵكی دەریدەخات، چ لە دنیادا، چ لە قیامەتدا، هەڵبەتە: ﴿ يَوْمَ تُبْلَى ٱلسَّرَآئِرُ ۝٩ ﴾ الطارق، لەوێ نهێنییەكان بەتەواویی كەشف دەبنو ئاشكرا دەبن.

**مەسـەلەی دەیـەم:** لەم سوورەتەدا باسی پێنج جۆرە زیندووبوونەوە کـراوە:

**یەکەمیان:** کە لە دەرسەکانی ڕابردوودا باسمان کرد، ئەو حەفتا (٧٠) کەسەی کە مووسا ﷺ بردنی کە داوایان کـرد خوا ﷻ ببینن‌و ئـەوەبوو، کە ئاگـرێك‌و هەورە تریشقەیەك لە ئاسمانەوە هـات لێیـدان‌و هەمـووی کوشـتن، دوایـی مووسا ﷺ پاڕایەوەو خوا زیندووی کردنەوە، وەك دەفەرموێ: ﴿ ثُمَّ بَعَثْنَاكُم مِّنْ بَعْدِ مَوْتِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴾، واتـە: لـەدوای مردنتـان زینـدوومان کردنەوە، بۆ ئەوەی سوپاسگوزاریی بکـەن، کە پێشـتـر باسمان کرد.

**دووەمیـان:** کـە هـەر لـە سـوورەتی (البقـرة)دا باسـکراوەو ئێسـتا خـەریکی توێژینەوەی ئـەو ئایەتانـەین: ﴿ فَقُلْنَا اضْرِبُوهُ بِبَعْضِهَا كَذَٰلِكَ يُحْيِ اللَّهُ الْمَوْتَىٰ وَيُرِيكُمْ آيَاتِهِ لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ﴾، کـە ئەنـدامێکی مانگـاکەیان لـەو جەنـازەیەداو پێـی زینـدوو بۆوە.

**سێیەمیان:** ئەوەیە کە لە ئایـەتەکـانی داهـاتوودا دەیگـەینێ، کـە دەفـەرموێ: ﴿ أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ خَرَجُوا مِن دِيَارِهِمْ وَهُمْ أُلُوفٌ حَذَرَ الْمَوْتِ فَقَالَ لَهُمُ اللَّهُ مُوتُوا ثُمَّ أَحْيَاهُمْ ...﴿٢٤٣﴾ ﴾ البقرة، واتە: ئایا سەرنجی ئەوانە نادەی، کە لـە ماڵـەکانی خۆیـان دەرچـوون بـە هـەزاران کـەس بـوون، لـە ترسـی مـردن، خـوا فەرمووی بمـرن، بەڵام دوایی زیندووی کـردنەوە...

**چـوارەمیان:** کـە توێـژەرانی قورئـان دەڵـێن: نـاوی عوزەیـر بـووەو عـوزەیریش هەندێك دەڵێن: پێغەمبـەرەو هەندێك دەڵـێن: پیـاوێکـی صـاڵح‌و چاکـبووە، کـە دەفـەرموێ: ﴿ أَوْ كَالَّذِي مَرَّ عَلَىٰ قَرْيَةٍ وَهِيَ خَاوِيَةٌ عَلَىٰ عُرُوشِهَا قَالَ أَنَّىٰ يُحْيِي هَٰذِهِ اللَّهُ بَعْدَ مَوْتِهَا فَأَمَاتَهُ اللَّهُ مِائَةَ عَامٍ ثُمَّ بَعَثَهُ قَالَ كَمْ لَبِثْتَ قَالَ لَبِثْتُ يَوْمًا أَوْ بَعْضَ يَوْمٍ قَالَ بَل لَّبِثْتَ مِائَةَ عَامٍ ...﴿٢٥٩﴾ ﴾ البقـرة، واتـە: یـان وەك ئەوەی کە بەلای شـارێکدا تێپەڕی، کە هەمووی بەسەریەکـدا ڕووخـاوە،

**(خەڵك مردوەو پەپوو لێی دەخوێنێ) گوتی: خوا چۆن دەبێ ئەوە پاش مردنی زیندوو بکاتەوە ! (وەنەبێ لەو ڕووەوە کە بڕوای پێی نیە نەخێر بەڵکو پێی سەیربوو)، ئنجا خوا ماوی سەد ساڵ مراندی‌و پاشان زیندووی کردەوەو فەرمووی: چەند ماویەوە؟ گوتی: ڕۆژێك، یان بەشێکی ڕۆژێك، فەرمووی: بەڵکو سەد ساڵ ماویەوە ...**

**پێنجەمیان:** ئەوەیە کە بۆ ئیبراهیم ﷵ ئەنجام دراوە: ﴿ وَإِذۡ قَالَ إِبۡرَٰهِـۧمُ رَبِّ أَرِنِي كَيۡفَ تُحۡيِ ٱلۡمَوۡتَىٰۖ قَالَ أَوَلَمۡ تُؤۡمِنۖ قَالَ بَلَىٰ وَلَٰكِن لِّيَطۡمَئِنَّ قَلۡبِيۖ قَالَ فَخُذۡ أَرۡبَعَةٗ مِّنَ ٱلطَّيۡرِ فَصُرۡهُنَّ إِلَيۡكَ ثُمَّ ٱجۡعَلۡ عَلَىٰ كُلِّ جَبَلٖ مِّنۡهُنَّ جُزۡءٗا ثُمَّ ٱدۡعُهُنَّ يَأۡتِينَكَ سَعۡيٗاۚ وَٱعۡلَمۡ أَنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٞ ﴿٢٦٠﴾ ﴾ البقرة، **دوای ئەوەی ﷺ داوا لە پەروەردگاری دەکات پێشانی بدات، چۆن مردووان زیندوو دەکاتەوە** ﴿ كَيۡفَ تُحۡيِ ٱلۡمَوۡتَىٰ ﴾، **نەیفەرمووە: پێت دەکرێ یان نا؟ لە چۆنییەتەکەی پرسیوە، پێم خۆشە بزانم چۆن ؟ دەزانم دەتوانی، بەڵام پێم خۆشە چۆنییەتەکەیم بۆ دەربکەوێ، بۆیە کاتێ خوا دەفەرموێ:** ﴿ أَوَلَمۡ تُؤۡمِن ﴾، **بۆ بڕوات بەوە نیە، کە خوا دەتوانێ ؟ ئیبراهیم دەڵێ:** ﴿ قَالَ بَلَىٰ وَلَٰكِن لِّيَطۡمَئِنَّ قَلۡبِي ﴾، **با، ئیمانم هەیە، بەڵام دەمەوێ دڵم زیاتر ئارام بگرێ‌و چۆنییەتەکەشی ببینم، ئنجا خوا پێی دەفەرموێ: چوار باڵندان بگرە هەریەکەی لە جۆرێك، وە سەریان ببڕەو گۆشتەکەیان تێکەڵ بکەو بیهەنجنە، دوایی هەر پارچە لەو پارچە گۆشتانە لەسەر چیایەك دابنێ، دوایی بانگیان بکە، گۆشتەکان دەچنەوە لای یەکدی‌و زیندوو دەبنەوە، ئیدی ئیبراهیم وایکردو تەماشای کرد، ئەو پارچە گۆشتانە دەچنەوە بۆ لای یەکدی‌و، چوار باڵندەکان دروست دەبنەوەو زیندوو دەبنەوە.**

**مەسەلەی یازدەیەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ ثُمَّ قَسَتۡ قُلُوبُكُم مِّنۢ بَعۡدِ ذَٰلِكَ فَهِيَ كَٱلۡحِجَارَةِ أَوۡ أَشَدُّ قَسۡوَةٗ ﴾، **خوای پەروەردگار باسی جوولەکەکان دەکاو**

سەرزەنشتیان دەکات (جوولەکەکانی سەردەمی پێغەمبەر ﷺ) دەفەرموێ: دوای ئەو هەموو موعجیزەو شتە گەورە گەورانەی کە باب‌و باپیرانتان بینیویانەو، ئێوەش لە کتێبەکانتاندا هەیەو بە بەشێك (لە کتێبی پیرۆز- الکتاب المقدس)و کەلەپووری خۆتانی دەزانن، ئنجا دڵیشتان ڕەق بوو وەك بەرد، یاخود لە بەرد ڕەقتریش، شایانی باسە توێژەرەوانی قورئان زۆر باسی ئەوەیان کردوە کە وشەی: (أو) واتە: (یان)، خۆ خوا ﷻ لە گوماندانیە، بەڵێ وەك بەرد ڕەق بوو، یاخود لە بەرد ڕەقتر، بۆیە کەوتوونەتە مشت‌ومڕەوە، کە ئایا تەئویلی ئەوە چییە؟ بەڵام من پێم وایە، کە ئەو مشت‌ومڕەی ناوێ‌و ماناکەی ئاوایە: وەك بەرد وایە، یان لە بەرد ڕەقترە، یانی هەندێکی وەك بەرد وایەو هەندێکیشی لە بەرد ڕەقترە، چونکە دڵەکان جۆراوجۆر بوون لە پلەی ڕەقییدا، هەندێکی وەك بەرد ڕەقەو، هەندێکی لە بەرد ڕەقترە، وەك ئاسن‌و پۆڵایەو، بەو شێوەیەن‌و پلەپلەن لە ڕەقیی‌و لە سەختییدا.

**مەسەلەی دوازدەیەم:** خوا ﷻ کە باسی دڵی جوولەکەکان دەکات، یانی: دڵی کافرەکانیان، یاخود هی زۆربەیان، یان هی ئەو جوولەکانەی کە بێبڕوا بوون بە پێغەمبەری کۆتایی، دەفەرموێ: دڵتان وەك بەردو لە بەرد ڕەقترە، پاشان باسی بەرد دەکات‌و، دەفەرموێ: بەرد هەیە دەبێتە شوێنی دەرقوڵێنی کانی‌و سەرچاوەو ڕووباری لێ دێتەدەرێ: ﴿ وَإِنَّ مِنَ ٱلْحِجَارَةِ لَمَا يَتَفَجَّرُ مِنْهُ ٱلْأَنْهَٰرُ ﴾، وە بەرد هەیە کە درز دەبات‌و کەم‌و زۆر ئاوی لێ دێتەدەرێ: ﴿ وَإِنَّ مِنْهَا لَمَا يَشَّقَّقُ فَيَخْرُجُ مِنْهُ ٱلْمَآءُ ﴾، وە بەرد هەیە کە لە ترسی خوا خلۆر دەبێتەوە: ﴿ وَإِنَّ مِنْهَا لَمَا يَهْبِطُ مِنْ خَشْيَةِ ٱللَّهِ ﴾، جا لێرەدا توێژەرەوان لە تەفسیری ڕستەی: ﴿ مِنْ خَشْيَةِ ٱللَّهِ ﴾، مشت‌ومڕیان بووە کە ئایا: بەرد ترسی خوای هەیە؟ یان مەبەست ئەوەیە کە ئەو بەردە پابەندە بەو یاسا فیزیکییانەی کە خوای پەروەردگار بۆی داناون کە لەسەرێڕا بێتە خوارێ؟ چونکە پابەندیی هەر مەخلووقێك بە یاسای بەدیهێنەریەوە، جۆرێکە لە ملکەچیی‌و جۆرێکە لە

لێترسانی، هەردوو تەفسیرەکان هەن‌و دەگونجێ هەم جەمادیش جۆرێك لە هەست (شعور)ی هەبێت، کە ئێمە نازانین چۆنەو، هەم خوا بەپاك بگرێ‌و هەم لە خوا بترسێ، وە دەشگونجێ مەبەست پێی ئەوەبێ کە دروستکراوەکان هیچیان لە یاساکانی خوا دەرناچن‌و، هەموویان بۆ ئەو سیستەمەی کە خوا بۆی داناون ملکەچن.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی پازدەیەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

لەم دەرسەماندا ئایەتەکانی (٧٥ تا ٨٢) تەفسیر دەکەین، ئەو هەشت (٨) ئایەتە، ناوەڕۆکەکەیان بریتیە لەوە کە خوا ﷻ بانگی ئیمانداران دەکات و وەك ئەهلی ئیسلام و ئیمان دەدوێنێ و تێیان دەگەیەنێ، کە نائومێدبن لە ئیمان هێنانی کەسانێك لە جوولەکەکان، کە لەڕووی زانایی و شارەزاییەوە ئیمان ناهێنن، واتە: زۆرچاك دەزانن کە ئیسلام هەقەو ڕاستە، بەڵام بەرژەوەندییان لەوەدا نیە، کە ئیمان بێنن، کە ئەوانە زاناکانی خاوەن کتێبەکان (أهل الکتاب)ن، کە بەرژەوەندیی ڕێگایان لێدەگرێ و، عەوامەکانیشیان کە تەنیا ڕواڵەتی کتێب دەزانن، یاخود هەروا خۆیان بە ڕواڵەتی دینەوە هەڵواسیوەو هیچی لێ حاڵی نین، ئەوانیش بەشێوەی لاساییکردنەوەی کوێرانە بەدوای زاناکانیان دەکەون! کەواتە: زاناکانیان لەبەر بەرژەوەندیی ئیمان ناهێنن، وە عەوامەکانیشیان لەبەر نەزانیی و لەبەر لاساییکردنەوەی کوێرانە بۆ زاناکانیان! ئاوا خوا حاڵەت و هەڵوێستی سەلبیی جوولەکەکان لە بەرانبەر ئیسلامدا دەخاتەڕوو، وە مسوڵمانان نائومێد دەکا لەوەی کە ئیمان بێنن، وە چەند هەڵوێستێکی جوولەکەکان، واتە: هەڵوێستی سەلبیی و خراپیان، چ لەڕووی ڕەفتارەوە، چ لەڕووی جۆری بیرکردنەوەیانەوە، دەخاتەڕوو.

﴿ أَفَتَطْمَعُونَ أَن يُؤْمِنُوا لَكُمْ وَقَدْ كَانَ فَرِيقٌ مِّنْهُمْ يَسْمَعُونَ كَلَامَ اللَّهِ ثُمَّ يُحَرِّفُونَهُ مِن بَعْدِ مَا عَقَلُوهُ وَهُمْ يَعْلَمُونَ ﴿٧٥﴾ وَإِذَا لَقُوا الَّذِينَ آمَنُوا قَالُوا آمَنَّا وَإِذَا خَلَا بَعْضُهُمْ إِلَىٰ بَعْضٍ قَالُوا أَتُحَدِّثُونَهُم بِمَا فَتَحَ اللَّهُ عَلَيْكُمْ لِيُحَاجُّوكُم بِهِ عِندَ رَبِّكُمْ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿٧٦﴾ أَوَلَا يَعْلَمُونَ أَنَّ اللَّهَ يَعْلَمُ مَا يُسِرُّونَ وَمَا يُعْلِنُونَ ﴿٧٧﴾ وَمِنْهُمْ أُمِّيُّونَ لَا

يَعْلَمُونَ ٱلْكِتَـٰبَ إِلَّآ أَمَانِىَّ وَإِنْ هُمْ إِلَّا يَظُنُّونَ ﴿٧٨﴾ فَوَيْلٌ لِّلَّذِينَ يَكْتُبُونَ ٱلْكِتَـٰبَ بِأَيْدِيهِمْ ثُمَّ يَقُولُونَ هَـٰذَا مِنْ عِندِ ٱللَّهِ لِيَشْتَرُوا۟ بِهِۦ ثَمَنًا قَلِيلًا ۖ فَوَيْلٌ لَّهُم مِّمَّا كَتَبَتْ أَيْدِيهِمْ وَوَيْلٌ لَّهُم مِّمَّا يَكْسِبُونَ ﴿٧٩﴾ وَقَالُوا۟ لَن تَمَسَّنَا ٱلنَّارُ إِلَّآ أَيَّامًا مَّعْدُودَةً ۚ قُلْ أَتَّخَذْتُمْ عِندَ ٱللَّهِ عَهْدًا فَلَن يُخْلِفَ ٱللَّهُ عَهْدَهُۥٓ ۖ أَمْ تَقُولُونَ عَلَى ٱللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴿٨٠﴾ بَلَىٰ مَن كَسَبَ سَيِّئَةً وَأَحَـٰطَتْ بِهِۦ خَطِيٓـَٔتُهُۥ فَأُو۟لَـٰٓئِكَ أَصْحَـٰبُ ٱلنَّارِ ۖ هُمْ فِيهَا خَـٰلِدُونَ ﴿٨١﴾ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ أُو۟لَـٰٓئِكَ أَصْحَـٰبُ ٱلْجَنَّةِ ۖ هُمْ فِيهَا خَـٰلِدُونَ ﴿٨٢﴾ ﴾

## مانای وشە بە وشەی ئایەتەكان

((ئایا (ئەی مسوڵمانینە!) بەتەمان (جوولەكەكان) ئیمانتان بۆ (بە ئیسلام) بێنن، لە حاڵێكدا كە كۆمەڵێكیان فەرموودەی خوا دەبیستن، پاشان دوای تێگەیشتنی دەیگۆڕن، وە دەشزانن (كە گۆڕینی كەلامی خوا تاوانێكی چەند زلە) ﴿٧٥﴾ وە كاتێك بەوانەی بڕوایان هێناوە دەگەن دەڵێن: بڕوامان هێناوە، بەڵام كە بەجیا بەیەكدی دەگەن دەڵێن: چۆن ئەوەی كە خوا بە ئێوەی بەخشیوە بۆیان باس دەكەن (واتە: بۆ مسوڵمانەكان) تاكو لەلای پەروەردگارتان لەسەرتان بە بەڵگە بێننەوە، ئایا نافامن؟ ﴿٧٦﴾ ئایا نازانن كە هەر شتێك پەنهانی بكەن‌و ئاشكرای بكەن خوا دەیزانێ؟ ﴿٧٧﴾ وە كەسانێكی نەشارەزایان هەن، كە جگە لە خۆزگە خواستن (وخەیاڵ پڵاو) هیچی دیكە لەبارەی كتێبەكەیانەوە نازانن‌و، پیشەیان بەس گومان‌و خەیاڵە ﴿٧٨﴾ دەجا سزای سەخت بۆ ئەوانەی كە بەدەستی خۆیان كتێب دەنووسن، پاشان دەشڵێن: ئەوە لەلایەن خواوەیە، تاكو نرخێكی كەمی پێ بكڕن، دەجا سزای سەخت بۆ وان، بەهۆی ئەوەوە كە بەدەستی خۆیان دەینووسن، وە سزای سەخت بۆوان بەهۆی ئەوەوە، كە بەدەستی دێنن (لە

بەرژەوەندی دنیایی) ﴿٧٩﴾ وە (جولەکەکان) گوتیان: جگە لە چەند ڕۆژێکی کەم ئاگرمان تووش نابێ، بڵێ: ئایا خوا بەڵێنی داونێ، کە بێگومان خوا بەڵێنی خۆی ناشکێنێ، یاخود شتێك کە نایزانن بەناوی خواوە دەیڵێن؟ ﴿٨٠﴾ با، هەرکەسێك خراپە بکات‌و تاوانەکەی گەمارۆی بدات، ئەوانە هاوەڵی ئاگرن‌و بە هەمیشەیی تێیدا دەمێننەوە ﴿٨١﴾ وە ئەوانەی بڕوایان هێناوەو کارو کردەوە چاکەکانیان ئەنجامداوە، ئا ئەوانە هاوەڵی بەهەشتن‌و بە هەمیشەیی تێیدا دەمێننەوە ﴿٨٢﴾)).

## شیکردنەوەی هەندێك لە وشەکان

(أَفَتَطْمَعُونَ ): (الطَّمَعُ نُزُوعُ النَّفْسِ إلى الشَّيءِ شَهْوَةً لَهُ، طَمِعْتُ أطْمَعُ طَمَعَاً)، واتە: ئایا تەماعتان هەیە، ئایا بەتەمان، ئایا ئومێدەوارن؟ لە (الطَّمَعُ)ەوە هاتوە (الطَّمَعُ): بریتیە لەوەی کە نەفس بەرەو شتێك بچێ، کە ئارەزوی لێبی، دەگوترێ: (طَمِعْتُ أطْمَعُ طَمَعَاً)، واتە: بەتەما بووم، بەتەما دەبم، بەتەما بوون.

(أَن يُؤْمِنُواْ لَكُمْ ): واتە: ئیمانتان بۆ بێنن، یانی: ئیمانتان بۆ بێنن بەو شتانەی، کە پێویستە ئیمانیان پێ بهێنرێ، بۆیە فەرموویەتی: ( يُؤْمِنُواْ لَكُمْ ) وشەی (یؤمنوا) (تَضْمِين)ی مانای: (إستِجَابَة) کراوە، واتە: (أن یستجیبوا لَکُم و یؤمنوا) کە بەدەنگتانەوە بێن‌و ئیمان بێنن.

(فَرِيقٌ ): (اسمٌ جَمع لاَ مُفرَدَ لَهُ) ناوی کۆمەڵە تاکی نیە، کە لە (فَرْق)ەوە هاتوە (الفَرْقُ: يُقَارِبُ الفَلْق والفِرْقُ: القِطعَةُ المُنْفَصِلةُ) واتە: (فَرْق) لە (فَلْق)ەوە نیزیکەو (فِرْق)یش بریتیە لە پارچەیەکی جیابۆوە (والفَرِيق: الجَمَاعَةُ المتفرِّقَةُ عَن آخَرِين) واتە: (فَرِيق) بریتیە لە کۆمەڵە خەڵکێك کە لە خەڵکی دیکە خۆیان جیاکردۆتەوە.

(يُحَرِّفُونَهُۥ): واتە: دەیگۆڕن، جا ئایا ئەوە لە چییەوە هاتوە؟ لە (حَرْف)ەوە هاتوە (حَرْفُ الشَّيءِ: طَرَفُهُ) (حَرْفُ)ی شتێك بریتیە لە كەناری ئەو شتە بە (أحْرُف وحروف) كۆ دەكرێتەوە، دەگوترێ: (حَرْفُ السَيفِ، وحَرْفُ السَفينَة) كەناری شمشێر، یان نووكی شمشێرەكەو، كەناری كەشتیەكە، (وتَحْريف الشَّيءِ إمَالته)، (تَحْريف)ی شتێك بریتیە لەوە كە بیگۆڕیو لایبدەی.

(خَلَا): (خلاَ إلَيهِ انتهَى إلَيهِ في خلوة) واتە: لە شوێنێكی چۆڵ چووە لای، (خَلاَ بهِ: صَارَ مَعَهُ في خَلاَء)، واتە: لە دەشتاییەك بەیەكەوە بوون، كەسێكی دیكەیان لەلا نەبوو.

(فَتَحَ ٱللَّهُ عَلَيۡكُمۡ): یانی: ئەوەی كە خوا بە ئێوەی داوە بەتایبەت (الفَتح: إزالَة إغلاَق الإشكَال مَحسُوساً كَانَ أو مَعنوياً)، (فتح) بریتیە لە لابردنی شتێك كە داخرابێ، یاخود ئیشكالێكی هەبێت، چ بەرهەست بێ چ مەعنەویی (وفَتحَ عَلَيهِ كَذا إذا أعلَمه وَوَافقه عَلَيهِ) كە بە كەسێك بگوترێ: (فتحَ عَلَيك) واتە: زانای كردو تەنیا ئەوی لەو شتە شارەزا كرد، كەواتە: ﴿فَتَحَ ٱللَّهُ عَلَيۡكُمۡ﴾، واتە: ئەو زانیارییەی كە خوا بە ئێوەی داوە ئەی ئەهلی كیتاب! بە غەیری ئێوە نەداوە.

(لِيُحَآجُّوكُم بِهِۦ): واتە: بۆ ئەوەی بەهۆیەوە بەڵگەتان لەسەر بێننەوەو موناقەشەتان لەگەڵ بكەن، چونكە دەڵێ: (المحاجَّة: أن يَطلُبَ كُل وَاحِدٍ أن يَرُدَّ الآخَرَ عَن حُجَّتِهِ ومَحجَّتِهِ) وشەی (المحاجَّة) ئەوەیە كە دوو لایەن، یاخود سێ لایەن، یاخود زیاتر هەر كامێكیان بیەوێ ئەوی دیكە لە بەڵگەكەی‌و لەسەر ڕێیەكەی لابداو، بیهێنێتە سەر قەناعەتی خۆی.

(يُسِرُّونَ): واتە ئەوەی كە پەنهانی دەكەن، لە (سِّر)ەوە هاتوە.

(يُعۡلِنُونَ): واتە ئەوەی كە ئاشكرای دەكەن، لە (عَلَن)ەوە هاتوە.

(**أُمِّيُّونَ**): واتە نەخوێندەوارەکان، عەوامەکان، نەشارەزایەکان.چونکە دەڵێ (الأُمِّي: هُوَ الَّذي لاَ يَكتبُ ولاَ يَقرأ مِن الكِتاب) (أُمِّي): کەسێکە کە نەدەنووسیو نەدەخوێنێتەوە لە کتێبدا، کەواتە: ئەگەر شتی لەبەربێ بیخوێنێتەوە، ئەوە پێچەوانەی (أُمِّي) بوون نیە، بۆیە پێغەمبەری ئێمە ﷺ هەرچەندە خوای پەروەردگار هەموو قورئانی فێرکردوەو خوێندووشیەتی، بەڵام هەر (أُمِّي)یش بووە، چونکە توانای خوێندنەوەی نەبووە لە کتێبدا، وە توانای نووسینی نەبووە، وەك خوای زاناو شارەزا دەفەرموێ: ﴿ وَمَا كُنتَ تَتْلُواْ مِن قَبْلِهِۦ مِن كِتَٰبٍ وَلَا تَخُطُّهُۥ بِيَمِينِكَ ۖ إِذًا لَّٱرْتَابَ ٱلْمُبْطِلُونَ ﴿٤٨﴾ ﴾ العنكبوت، واتە: (ئەی پێغەمبەر ﷺ) تۆ لەپێش قورئاندا نە هیچ کتێبێکت خوێندۆتەوەو نە هیچ کتێبێکت بەدەستی ڕاست نووسیوە، ئەگەر خوێندنو نووسینت ببووایە ئەوانەی کە کافرن بۆیان هەبوو بکەونە گومانەوە، بەڵام کە خوێندنو نووسینت نەبێ، ئەوە دیارە کە ئەم قورئانە خوا فێری کردووی، کەواتە (أُمِّي) کەسێکە خوێندنو نووسینی نەبێت، ڕایەکی دیکەش دەربارەی مانای (أُمِّي) ئەوەیە کە (أُمِّي) کەسێکە شارەزای کتێبو وەحی خوا نەبووبێ.

(**أَمَانِيَّ**): کۆی (أمنيَة)یە (الأمنيَّة: هِيَ الصورَة الحاصِلَة فِي النَّفْس مِن تمَنِّي الشَّيء، والتَمَنِّي: الكَذب، وقَالَ عُثمَان لاَتغَنَّيْتُ ولاَ تَمَنَّيْتُ مُنْذُ أسلَمْتُ، أو التِلاَوَة بِلاَ مَعرِفَة المَعنى) (تَمَنِّي) هەم بەمانای خۆزگە خواستنو خەیاڵ پلاو دێت، هەم بەمانای درۆکردن دێ، وەك (عُثمَان) خوا لێی ڕازی بێ گوتوویەتی: لەوەتی مسوڵمان بووم نەگۆرانیم گوتوە، نەدرۆم کردوە، وە هەم بەمانای خوێندنەوەی ڕووکەشو ڕواڵەتییش دێ.

(**يَظُنُّونَ**): (الظَّن: اسْمٌ لِمَا يَحصُلُ عَن أمَارَةٍ ومَتَّى قَوِيَت أدَّت إلى العِلم، ومَتَى ضَعُفَتْ جِداً لَمْ تجَاوز حَدَّ التَوَهُّمِ)، واتە: گومان دەبەن، کە لە: (ظَّن)ەوەیەو ئەمیش ناوە بۆ هەرشتێك کە بەهۆی نیشانەکەیەوە

پەیدادەبێت، جا ئەگەر نیشانەکە زۆر بەهێز بێت زانیارییت بۆ پەیدادەکا، وە ئەگەر نیشانەکە بێهێزبێ تەنیا جۆرێك لە وەهم و دوودڵییت بۆ پەیدا دەبێت.

(**وَوَيۡلٌ**): (قَالَ: الأصْمَعِيّ: وَيلٌ: قُبحٌ، وقَدْ يُسْتَعْمَلُ للتَحَسُّر) (وَیل) لە زمانی عەرەبییدا بەمانای شتی ناشیرین و ناقۆڵا دێ، وە بەمانای خەفەت خواردن دێت، (المعجم الوسيط)یش دەڵێ: (الويلُ: حُلُولُ الشَّرِّ وَكَلِمَةَ العَذاب) (وَیل)، ئەوەیە کە شەڕو خراپەیەك ڕوو لە ئینسان بکات، وە بریاری سزاو ئازارە.

(**لِيَشۡتَرُواْ**): وشەی (اشترى) لە زمانی عەرەبیدا، وە لە بەکارهێنانی قورئاندا، هەم بەمانای کڕین دێت، هەم بەمانای فرۆشتن دێت، بەڵام زیاتر بەمانای کڕین دێت، (فالبَّيعُ والشِّرَاءُ يَتلازمَان: فَالمُشتَري يَدْفَعُ الثَّمَنَ ويأخذَ المُثمَّنَ، والبائِعُ يَدْفَعُ المُثمَّنَ ويأخذَ الثَّمَنَ...) واتە: فرۆشتن و کڕین پێکەوە پەیوەستن، چونکە کڕیار نرخ دەدات و نرخ لەسەر دانراو وەردەگرێ و، فرۆشیاریش نرخ لەسەر دانراو دەداو نرخ وەردەگرێ.

(**تَمَسَّنَا**): (المَسُّ كاللَمسِ لَكِن اللَّمْسُ قَدْ يُقالُ لِطلَبِ الشَّيءِ وإنْ لَمْ يُوجد، والمَسُّ يُقالُ في ما يَكُونُ مَعَهُ إِدرَاكٌ بِحَاسّةِ اللَّمْسِ) ڕستەی: ﴿ لَن تَمَسَّنَا ٱلنَّارُ ﴾، واتە: ئاگرمان تووش نابێ و ئاگرمان ناگاتێ، چونکە وشەی: (لمَسْ) وەك (مَس) وایە، بەڵام (لَمْس) بۆ داواکردنی شتێکە با ئەو شتە نەشبێ، بەڵام (مَسّ) بریتیە لەوەی کە دەستی لێبدرێت.

(**بَلَىٰ**): (بَلَى: رَدٌّ للنفي أو جَوابٌ لإستِفهامٍ مُقتَرِنٍ بنفي، نَحو قولهِ تعالى: ﴿ ...أَلَسۡتُ بِرَبِّكُمۡۖ قَالُواْ بَلَىٰ... ﴿١٧٢﴾ ﴾ الأعراف، لە کوردیدا (نَعَم) واتە: بەڵێ، بەڵام (بَلَى)، واتە: با، وە وشەی: (بَلَى) بۆ بەرپەرچدانەوەی لابرانێکە، یان وەڵامی پرسیارێکی جووتکراوە لەگەڵ نەفییدا، نموونەی حاڵەتی یەکەم: ﴿ وَقَالُواْ لَن تَمَسَّنَا ٱلنَّارُ إِلَّآ أَيَّامٗا مَّعۡدُودَةٗ ﴾، واتە: گوتیان:

ئاگرمان تووش نابێت، مەگەر چەند ڕۆژێکی کەم، جوولەکەکان بە خەیاڵ پڵاو وایان گوتووە، کە ئەگەر بچنە دۆزەخیش، هەرچەند ڕۆژێکی کەم دەسووتێن، خوا دەفەرمویٚ: (بَلَى) با، تووشتان دێت.

نموونەی حاڵەتی دووەم: خوا دەفەرمویٚ: ﴿...أَلَسْتُ بِرَبِّكُمْ قَالُوا بَلَى...﴿١٧٢﴾﴾ الأعراف ، واتە: ئایا پەروەردگارتان نیم؟ گوتیان: با، دیارە ئەگەر بڵێن: بەڵێ (نَعَم) بە پێچەوانە دەردەچیٚ، واتە: بەڵێ پەروەردگارمان نی !! یەکیٚ بەتۆ دەڵیٚ: ئایا چاکەم لەگەڵ نەکردی؟ ئەگەر بڵێی: بەڵیٚ، واتە: بەڵێ لەگەڵت نەکردووم، بەڵام کە گوتت با، واتە: لەگەڵت کردووم.

(كَسَبَ): (الكَسْبُ: مَا يَتَحَرَّاهُ الإنْسَانُ مِمَّا فِيهِ اجْتِلابُ نَفْعٍ وتَحْصِيلُ حَظٍّ كَكَسْبِ المَالِ) (الكَسبُ)، واتە: وەدەستهێنان، بریتیە لەوەی کە ئینسان مشووری پەیداکردنی دەخوا، لەوەی کە سوودێکی پیٚ وەدەست دەهێنریٚ، یاخود پێی بە موراد دەگات، وەك بەدەستهێنانی ماڵ.

(سَيِّئَةً): (السَيئة: الفِعلَة القَبِيحَة، وَهِيَ ضدّ الحَسَنَة) (سَيئة) هەر کردەوەیەکی ناشیرین و ناقولایەو دژی چاکەیە. (والسوءُ كُلُ مَايُغِمُّ الإنسانَ مِنَ الأمور الدنيَوِيَة والأخرَوِيَة) دیارە (سَيئَة) لە (سوء)ەوە هاتوە ئەمیش واتە: هەر شتێکە کە ئینسان پێی خەفەتبار بێت، لە کاروباری دنیا یاخود دواڕۆژ.

(خَطِيٓـَٔتُهُۥ): لە (خَطَأ)ەوە هاتوە (الخَطَأُ: العُدُولُ عَنِ الجِهَةِ) (خَطَأ) ئەوەیە کە ئینسان لە ڕێگایەکی ڕاست لابدات بەرەو ڕێیەکی هەڵە، (الخَطِيئَةَ والسَيئَةَ يَتَقَارَبانِ) واتە: (خَطِيئَةَ) و (سَيئَةَ) مانایەکەیان لێك نیزیکە، دەگوتریٚ (خَطِيءَ يَخْطَأُ خِطأً)، واتە: گوناهی کرد، بەڵام دەگوتریٚ (أخطَأَ يُخطيء خطأً) واتە: بەهەڵەداچوو، وە (خَطِيئَةَ) واتە گوناهێك کە بەئەنقەست کرابیٚ.

(**أَصۡحَـٰبُ**): کۆی (صَاحِب)ە، بەمانای هاوەڵ دێت، وە بەمانای خاوەنیش دێت، (الصَاحِب: المـلازِمُ، إنسانـاً كان أو حَيواناً أو مكاناً أو زماناً، ويُقالُ لِمالِكِ الشَّيءِ هُوَ صَاحِبُهُ)، (صَاحِب) هەر شتێکە، کە بەردەوام لەگەڵ ئینسان دابێ، جا چ ئینسان بێت، چ ژیاندار بێت، چ کات بێت، چ شوێن بێت، وە بەخاوەنی شت دەگوترێ: ئەوە (صَاحِب)یەتی.

## هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتەکان

١/ هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو ئایەتە، کە دەفەرموێ: ﴿ قَالُوٓاْ أَتُحَدِّثُونَهُم بِمَا فَتَحَ ٱللَّهُ عَلَيۡكُمۡ لِيُحَآجُّوكُم بِهِۦ عِندَ رَبِّكُمۡۚ أَفَلَا تَعۡقِلُونَ ﴾، واتە: ئایا بۆ مسوڵمانەکان باس دەکەن ئەوەی، کە خوا بە تایبەت بە ئێوەی داوە (ئەی جوولەکەکان) بۆ ئەوەی لە قیامەتێ لەسەرتان بکەنە بەڵگە، لە زۆربەی تەفسیرەکاندا ئاوا هاتوە: {(أَخرَجَ ابن جَرير، وابن أبي حاتم عَن السُدِّي، قَالَ: نَزَلَتْ هَذِهِ الآيَة في ناسٍ مِنَ اليَّهُود آمَنوا ثُمَّ نافَقوا، وكانوا يُحَدِّثونَ المؤمنينَ مِن العَرَب بِمَّا عُذِّبوا بِهِ، فَقَالَ: بَعْضُهم لِبَعْضٍ: ﴿ أَتُحَدِّثُونَهُم بِمَا فَتَحَ ٱللَّهُ عَلَيۡكُمۡ ﴾، مِنَ العَذَابِ لِيَقولُوا نَحْنُ أحبُ إلى اللهِ مِنْكُم وَأَكْرَم عَلَى اللهِ عَلَيكُم؟! ) (تفسير الطبري، تفسير ابن كثير، وفتح القدير، للشوكاني، ج: (١)، ص: (١٤٤)}، واتە: ئەم ئایەتە دەربارەی هەندێك لە جوولەکەکان هاتە خوار، کە ئیمانیان هێناو دوایی بوونە مونافیق، وە بۆ مسوڵمانەکانیان باسدەکرد، دەیانگوت: ئێمە (واتە: پێشووەکان) کاتی خۆی خوا، ئاواو ئاوا سزاو ئازاری داوین، زاناکانیان سەرزەنشتیان کردن، گوتیان بۆچی شتێکیان بۆ باس دەکەن کە خوا ئێوەی پێ سزا داوە، تاکو دوایی ئەوان (واتە: مسوڵمانەکان) لەسەرتان بکەنە بەڵگەو بڵێن: ئێمە لەلای خوا خۆشەویسترین و بەرێزترین ؟

٢/ هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو ئایەتەی کە دەفەرموێ: ﴿ فَوَيۡلٌ لِّلَّذِينَ يَكۡتُبُونَ ٱلۡكِتَـٰبَ بِأَيۡدِيهِمۡ ﴾، {(أَخْرَجَ ابْنُ أَبِي حَاتِم عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ فِي قَولِهِ: ﴿ فَوَيۡلٌ

لِّلَّذِينَ يَكْتُبُونَ ٱلْكِتَٰبَ بِأَيْدِيهِمْ ﴾، هُم أحبَارُ اليَهُود وجدُوا صِفَةَ النَّبِيّ مَكتُوبَة في التوراة: أكْحَلَ، أعْيَنَ، ربعة، جَعْدُ الشَّعرِ، حَسَنُ الوَجهِ، فَلَمَّا وَجَدُوهُ في التوراة مَحَوْه حَسَداً وبَغياً، وفأتاهم نفَرٌ مِن قُرَيش فَقَالُوا: تجدونَ في التوراة نبياً أمّياً ؟ فقَالُوا: نَعَم نجدهُ: طَويلاً، أزرَق، سَبِط الشعر، فأنكَرَت قُرَيش و قالوا: لَيسَ هَذا مِنّا) (فتح القدير للشوكاني، ج: (١)، ص: (١٤٨)}، واتە: (إبن أبی حاتم) لە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسەوە خوا لێیان ڕازی بێ، هێناویەتی دەربارەی ئەم ئایەتە، کە زاناکانی جوولەکە سیفەتی پێغەمبەریان ﷺ لە تەوراتدا بینی کە دەفەرموێ: - چاوو برۆی ڕەشن، چاوی گەورەن، دەستە پیاوە، قژی مەیلەو لوولەو، دەموچاوی جوانە، کاتێک ئەوەیان لە تەوراتدا بینی بە هۆی حەسەدو یاخیبوونەوە، ئەوەیان سڕیەوە، ئنجا کۆمەڵێک لە قوڕەیشییەکان هاتن بۆ لای جوولەکەکان گوتیان: ئایا لە تەوراتدا باسی ئەو پێغەمبەرە نەخوێندەوارە کراوە ؟ (واتە: باسی موحەممەد) گوتیان: بەڵێ باسکراوە، بەڵام بەم شێوەیە باسکراوە: کە پیاوێکی باڵا درێژە، چاوی شینن و پرچیشی نەرمە، قوڕەیشییەکان گوتیان: کەواتە بەسەر موحەممەدی ئێمەدا نایەتە دی، وە دیارە عەوامەکانی خۆشیان هەربەوە هەڵدەخەڵەتاندو دەیانگوت: ئەوەتا لە تەوراتدا دەڵێ: پێغەمبەری کۆتایی زۆر باڵای درێژەو چاوی شینن و قژی خاوە، کەواتە: ئەو سیفەتانە بەسەر موحەممەددا نایەنە دی، ئاوا کڵاویان لەسەری عەوامەکانی خۆیان دەنا !

٣/ هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو ئایەتەی، کە دەفەرموێ: ﴿ وَقَالُوا۟ لَن تَمَسَّنَا ٱلنَّارُ إِلَّآ أَيَّامًا مَّعْدُودَةً ﴾، {أخْرَجَ عَبْد بْنُ حُمَيد، وَابْنُ جَرِير، وَابْنُ الْمُنذِر، وَابْنُ أَبِي حَاتِم عَنْ عِكرِمَة قَالَ: اجتمَعَت يَهود يَوْماً فَخَاصَمُوا النَّبِيّ ﷺ فَقَالُوا: ﴿ لَن تَمَسَّنَا ٱلنَّارُ إِلَّآ أَيَّامًا مَّعْدُودَةً ﴾ أربَعِينَ يَوْماً ثُمَّ يَخْلُفُنَا أُناسٌ فِيهَا وأشاروا إلى النَّبِيّ وأصحَابِهِ، فَقَالَ رَسُولَ اللهِ ﷺ وَرَدّ يَدَيهِ عَلَى رَأسِهِ: كَذَبْتُمْ بَلْ أَنْتُم خَالِدُون مُخَلَّدونَ فِيهَا لانَخْلُفُكُم فِيهَا إن شاءَ الله أبَداً، فَفِيهِم نَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةَ، وَقَالُوا: ﴿ لَن تَمَسَّنَا ٱلنَّارُ ﴾}، واتە: ڕۆژێک

جوولەکەکـان کـۆبوونەوە موناقەشـەیان کـرد لەگـەڵ پێغەمبـەر ﷺ گوتیـان: ئێمە بەس لە چەند ڕۆژێکی کەم، چل ڕۆژ، سزا دەدرێین لـە دۆزەخـدا، دوایـی خەڵکێك دێنە شوێنی ئێمەو لەجیاتی ئێمە سزا دەدرێـن، وە ئاماژەیـان کـرد بـۆ پێغەمبـەرو بـۆ هاوەڵانی، پێغەمبـەری خـواش دەسـتی بەرزکردنـەوە فـەرمووی: حاشـا درۆ دەکـەن، بەڵـکو ئێـوە بـە هەمیـشەیی لـە دۆزەخـدا دەمێننـەوەو، هەرگیـز ئەگەر خوا حەز بکـات، ئێمـە نایەینـە شـوێنی ئێـوە، ئیـدی لـەوبارەوە ئـەو ئایەتـە هاتـە خـوار، هـەروەها هـەمان شـت ئیمـام ئەحمـەدو بوخـاریی‌و نەسـائیی‌و ئـەبوو داوودیـش لـە ئـەبی هورەیرەوە هێناویانـە: {(أَنَّ النَّبِـيَّ ﷺ سَأَلَ الْيَهُـودَ فـي خَيْبَرَ: مَنْ أَهْـلُ النَّـارِ؟ قَالُوا: نَكُونُ فِيهَا يَسِيراً، ثُمَّ تَخْلُفُونَـا فِيهَـا، فَقَـالَ لَـهُم رَسُـولُ اللهِ ﷺ: إخسَـأُوا فِيهَـا، وَاللهِ لاَ نَخْلُفُكُم فِيهَـا أَبَدَاً) (رَوَاهُ الْبُخَارِيُّ بـرقم: (٣١٦٩)، عَنْ أَبي هُرَيـرَةَ رضي الله عنه}، واتـە: پێغەمبـەر ﷺ لـە جوولەکەکـانی خەیبـەری پرسـی: کێن دەچـنە دۆزەخ؟ گوتیـان: ئێمـە تۆزێکـی تێدا دەمێنینـەوە، بـەڵام دوایـی ئێـوە دێنـە جێـی ئێمـەو بـە هەمیـشەیی تێیـدا دەمێننەوە، پێغەمبەری خواش فەرمووی: بێ دەنگ بن! بەڵـکو سوێند بەخـوا هەرگیـز ئێمە شـوێنی ئێوە ناگرینەوە لە دۆزەخـدا.

هـەروەها (النیـسابوري) لـە (أسـباب النـزول)دەکەیـدا هـەمان شـتی هێنـاوە، لەوێـدا دەڵـێ گوتوویانـە: تەمـەنی دنیـا حـەوت هـەزار (٧٠٠٠) سـاڵەو ئێمـە لـەجیاتی هـەر هـەزار سـاڵ ڕۆژێـك سـزا دەدرێـین، کەواتـە: هەفتەیـەك لـە دۆزەخدا دەمێنینەوە! ئاوا بەو خەیـاڵ پڵاوانە خۆیان پەڕاندۆتەوە!

## مانـای گشـتی ئایـەتەکـان

خـوا ﷻ ڕوو لـە مـسوڵمانان دەکـات، دیـارە سـەرەتا ڕوو لـە پێغەمبـەرو ﷺ مـسوڵمانانێك کـە لـە خزمـەتی دابـوون، بـەڵام لـە دوای ئـەوانیش ڕوو لـە هـەموو جیلەکانی مسوڵمانان دەکات، ئێمەو پـێش ئێمـەو دوای ئێمـەش‌و حەقیقەتێکمـان پـێ ڕادەگەیـەنێ، کـە ئـەو حەقیقەتـەش لـە مێـژوودا دەرەوشـاوەتەوە وەك مـانگی

چوارده له شەوی تاریکدا، دەفەرمویْ: ﴿ أَفَتَطْمَعُونَ أَن يُؤْمِنُوا لَكُمْ ﴾ ئایا بەتەمان جوولەکەکان ئیمان بێنن لەبەر خاتری ئێوە !، واتە: وەڵامتان بدەنەوەو ئیمان بێنن بە ئیسلام؟ دیارە مەبەست پێی زۆربەیانە، وە بەتایبەتی کافرە سەرسەختەکان، ئەگەرنا ئەوانەی کە ئیمانیان هێناوە، بێگومان وەبەر ئەو حوکمە ناکەون، ﴿ وَقَدْ كَانَ فَرِيقٌ مِّنْهُمْ يَسْمَعُونَ كَلَامَ اللَّهِ ثُمَّ يُحَرِّفُونَهُ مِن بَعْدِ مَا عَقَلُوهُ وَهُمْ يَعْلَمُونَ ﴾، واتە: چۆن ئیمان دێنن! لەحاڵێکدا کە کۆمەڵێك لەوان گوێیان لە فەرمایشتی خوا بوو دوایی دەیانگۆڕی، دوای ئەوەی کە تێیگەیشتبوون، وە دەشزانن گۆڕینی فەرمایشتی خوا چ تاوانێکی گەورەیە، ئنجا لەگەڵ ئەوەشدا فەرمایشتی خوایان گۆڕی ئێستا چۆن ئیمان دێنن بە ئیسلام؟! کە مەبەست پێی ئەوانەیە کە لەدوای مووسا ﷺ دەستکاریی تەوراتیان کرد، لەبەر بەرژەوەندیی خۆیان، وە مەبەستیش پێی ئەو جوولەکانەیە کە لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ، زۆر لە یاساکانی تەوراتیان گۆڕی، دوای ئەوەی کە لەگەڵ بەرژەوەندییەکانیاندا تێکدەگیران، کە خوا یاربێ لە دەرسەکانی داهاتوودا بەتایبەتی لە تەفسیری سوورەتی (المائدة) ئەگەر خوای پەروەردگار تەمەنیدا باسی دەکەین، وە یەکێك لەو شتانەی کە گۆڕییان بریتی بوو لە ناوونیشانەکانی پێغەمبەر ﷺ کە لە تەوراتدا هاتوون، وەك لە باسی هۆی هاتنە خوارەوەدا ڕوونمان کردەوە. ﴿ وَإِذَا لَقُوا الَّذِينَ آمَنُوا قَالُوا آمَنَّا ﴾، باسی هەڵوێستەکانیان دەکاتو دەفەرموێ: ئەو جوولەکانە کاتێك کە دەگەنە ئیمانداران دەڵێن: ئیمانمان هێناوە ﴿ وَإِذَا خَلَا بَعْضُهُمْ إِلَىٰ بَعْضٍ ﴾، بەڵام ئەگەر هەندێکیان بەجیا لە شوێنی چۆڵ یەکدیان بینی، ئەوە ئەوانەی کە ئیمانیان نەهێناوە، سەرزەنشتی ئەوانە دەکەن کە ئیمانیان هێناوە، یاخود لەلای مسوڵمانەکان خۆ بە ئیماندارو مسوڵمان پیشان دەدەن بە (نیفاق)، سەرزەنشتیان دەکەنو دەڵێن: ﴿ قَالُوا أَتُحَدِّثُونَهُم بِمَا فَتَحَ اللَّهُ عَلَيْكُمْ ﴾، گوتیان: ئایا ئەوەیان بۆ باس دەکەن کە خوا بەتایبەت ئێوەی لێ ئاگادارکردۆتەوەو ئێوەی لێ شارەزا کردوە ﴿ لِيُحَاجُّوكُم بِهِ

عِندَ رَبِّكُمْ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴾، بۆ ئەوەی لە قیامەتێ بەڵگەتان لەسەر بێننەوە لای پەروەردگارتان وە دەم کوتتان بکەن (کە یەکێك لەو شتانە نیشانەکانی پێغەمبەرە ﷺ) ئایا نافامن ؟! واتە: هەندێك لە جوولەکەکان هەندێکیان بە (نیفاق)و هەندێکیشیان بە دڵ سافیی، دەچوونە لای مسوڵمانەکانو دەیانگوت: وەڵڵاهی نیشانەکانی پێغەمبەری ئێوە ﷺ لە تەوراتی ئێمەدا هەیە ! ئەوانی دیکەش سەرزەنشتیان دەکردنو دەیانگوت: ئەو قسانە بۆ بڵاودەکەنەوە، دوایی ئەوان لە قیامەت لەسەرمان دەکەنە بەڵگە کە ئێمە زانیومانە موحەممەد پێغەمبەری کۆتایی یە ﷺ، بەڵام ئیمانمان پێ نەهێناوە، جا بەیەکدییان دەگوت: ئایا نافامن نازانن کە ئەوە بە زەرەری خۆمان تەواو دەبێ ؟! خوا دەفەرموێ: ﴿ أَوَلَا يَعْلَمُونَ أَنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ مَا يُسِرُّونَ وَمَا يُعْلِنُونَ ﴾، ئایا نازانن کە خوا دەزانێ ئەوەی کە پەنهانی دەکەنو دەیشارنەوەو ئەوەش کە ئاشکرای دەکەن، هیچ شتێك لە خوا ون نابێت ؟! ئەوە بەنسبەت هەڵوێستی زاناکانیان، ئنجا دێتە سەرباسی عەوامەکانیان﴿ وَمِنْهُمْ أُمِّيُّونَ ﴾، کەسانێکیان هەن نەخوێندەوارو نەشارەزان ﴿ لَا يَعْلَمُونَ ٱلْكِتَٰبَ إِلَّآ أَمَانِيَّ ﴾، هیچ دەربارەی کتێب نازانن، جگە لە خۆزگە خواستن، یاخود جگە لە درۆکردن هەر بە درۆو ئەفسانە بەدوا کەوتوون، یاخود جگە لە خوێندنەوەیەکی ڕووکەشی کە پێیدا قووڵ نابنەوە، وەك پێشتر گوتمان وشەی (أماني) هەرسێك واتاکەی هەن، ﴿ وَإِنْ هُمْ إِلَّا يَظُنُّونَ ﴾، وە دینداریيەکەیان تەنیا بریتیە لە گومان بردن، وەك دەڵێ: بەدوای کڵاوی خوار کەوتوون، جا خوا دەفەرموێ :﴿ فَوَيْلٌ لِّلَّذِينَ يَكْتُبُونَ ٱلْكِتَٰبَ بِأَيْدِيهِمْ ثُمَّ يَقُولُونَ هَٰذَا مِنْ عِندِ ٱللَّهِ ﴾، دەجا سزای سەخت بۆ ئەوانەیان کە بەدەستی خۆیان کتێب دەنووسن، دیارە کتێب هەر بەدەستی دەنووسرێ، بەڵام لێرەدا وەك ڕەوانبێژان دەڵێن: بۆ ئەوەی کە بۆمان بەرجەستە بکات کە ئەوا دەستەکەی دەبینی بەتەزویرو بە ساختەو فێڵ دەینووسن، دواییش دەڵێن: ئەوە لەلایەن خواوەیە، بۆ خۆیان نووسیویانە، کەچی دەڵێن: خوا ناردوویەتی، جا

ئایا بۆچیو ئامانجیان چییە لەو کتێب نووسینە؟ ﴿لِيَشْتَرُواْ بِهِۦ ثَمَنًا قَلِيلًا﴾، بۆ ئەوەی کە نرخێکی کەمی پێبکڕن، واتە: بەرژەوەندییەکی کەمی دنیایی پێ دابین بکەن، کە ئەگەر هەموو دنیابێ هەر بە کەم دادەنرێ، چونکە وەك خوا دەفەرموێ: ﴿...فَمَا مَتَٰعُ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا فِى ٱلْءَاخِرَةِ إِلَّا قَلِيلٌ ﴿٣٨﴾﴾ التوبة، واتە: ڕابواردنی دنیاو بەرژەوەندیی دنیا لەچاو دوارۆژ هەرکەمە، جا خوا هەڕەشەیان لێدەکاتو، دەفەرموێ: ﴿فَوَيْلٌ لَّهُم مِّمَّا كَتَبَتْ أَيْدِيهِمْ وَوَيْلٌ لَّهُم مِّمَّا يَكْسِبُونَ﴾، جا سزای سەخت بۆ ئەوان لەسەر ئەوەی کە بەدەستی خۆیان دەینووسن، کردەی دەستو زادەی بیرو هۆشی خۆیانە، کەچی پاڵی دەدەنە لای خوا، جا ئا ئەوەیە کە دین سووك دەکات، کاتێك کە ئەفسانەو شتی داهێنراوو شتی پەیداکراو بە دین زانرا، دیارە شتی داهێنراو پەیداکراویش لەگەڵ عەقڵو عیلم ناگونجێو لەگەڵ فیطرەتو سروشتی ئینسان ناگونجێ، دوایی خەڵك بەهۆی ئەو داهێنراوەوە، لە ئەسڵی دینەکە بەگشتی دەکەوێتە گومانەوە، بۆیە دەفەرموێ: سزای سەخت بۆوان لەسەر ئەوە کە بەدەستی خۆیان دەینووسن، وە سزای سەخت بۆوان لەسەر ئەوە کە بەدەستی دێنن، بەهۆی کتێب نووسینو بەهۆی شت پەیداکردنو داهێنانەوە بەناوی دینەوە، ئنجا باسی هەڵوێستێکی دیکەیان دەکاتو، دەفەرموێ: ﴿وَقَالُواْ لَن تَمَسَّنَا ٱلنَّارُ إِلَّآ أَيَّامًا مَّعْدُودَةً﴾، وە گوتیان (بە خەیاڵ پڵاو) ئێمە ئەگەر بچینە دۆزەخیش جگە لە چەند ڕۆژێکی کەم ئاگرمان تووش نابێ، خوای دادگەریش دەفەرموێ: ﴿قُلْ أَتَّخَذْتُمْ عِندَ ٱللَّهِ عَهْدًا﴾، واتە: ئەم قسەیەتان لە دووحاڵ بەدەرنییە: یان خوا بەڵێنێکی پێداون، کە بەدڵنیایی خوای پەروەردگار بەڵێنی خۆی هەر جێبەجێ دەکاتو بەڵێنی خۆی ناشکێنێ، یاخود شتێك دەڵێن: بەناوی خواوە کە زانیاریتان دەربارەی نییە؟! بەدڵنیایی دیارە کە خوا بەڵێنی پێ نەداون، ئەگەرنا دەبوو هەبووایە، کەواتە: درۆیەك دەکەن بەناوی خواوەو لە خۆوە شتێك دەڵێن کە زانیارییتان دەربارەی نییە، ئنجا خوا ﷻ ئەو خەیاڵ پڵاوەیان بەدرۆ دەخاتەوەو، دەفەرموێ: ﴿بَلَىٰ مَن كَسَبَ

سَيِّئَةً وَأَحَٰطَتۡ بِهِۦ خَطِيٓـَٔتُهُۥ فَأُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِۖ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴾، بـــا، هەر کەسێك خراپەی وەدەست هێنـابێ و گوناهەکـانی ئابلۆوقـەو گـەمارۆیان دابێ و هێنـدەی خراپـە هـەبن تێیانـدا نـوقم بووبـێ، ئـا ئەوانـە هـاوەڵی ئاگـرن بـە هەمیشـەیی تێیدا دەمێننـەوە ﴿ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ أُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلۡجَنَّةِۖ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴾، وە ئەوانەی کە ئیمانیان هێناوە، وە کردەوە باشـەکان ئـەنجام دەدەن، ئـا ئەوانـەش هـاوەڵی بەهەشـتن یـاخود خـاوەنی بەهەشـتن، بـە هەمیشـەیی تێیدا دەمێننەوە.

## چـەند مەسـەلەیـەکی گرنـگ

**مەسـەلەی یەکـەم:** حیکمـەتی نائومێـدکردنی مـسوڵمانان، هـەم مـسوڵمانانی سەردەمی پێغەمبەر ﷺ هەم هی دوای ئـەوان، هـەم ئێمـەو هـی دوای ئێمـەش، لەوە کـە جوولەکەکـان زۆربەیان مسـوڵمـانبن، دوو شـتە:

**یەکەم** : ئەوەیە کە کاتی خۆتیان لەگـەڵ بەفیـڕۆ نەدەی.

**دووەم** : ئەوەیـە کـە مـسوڵمانان نەکەونـە گومانـەوە، بـەهۆی ئـەوەوە کـە جوولەکەکـان بەتایبـەتی و خـاوەن کتێبەکـان بەگـشتی ئیمـان نـاهێنن، مسـوڵمانان نەکەونە گـومانەوە بڵـێن: ڕەنگە ئێمـە لەسـەر ناهـەق بـین، بۆیـە ئیمـان نـاهێنن، بـەڵکو بۆیـە ئیمـان نـاهێنن، چـونکە بەرژەوەنـدیی ڕێیـان لـێ دەگـرێ دەمارگیـریی (تَعَصُّب) ڕێیـان لـێ دەگرێ.

**مەسـەلەی دووەم:** دەربـارەی ئـەوە کـە دەفـەرموێ: ﴿ يَسۡمَعُونَ كَلَٰمَ ٱللَّهِ ﴾، توێژەرانی قورئـان مشـتومڕی زۆریان بووە لەوبارەوە کـە ئایـا مەبەسـت چییە لە گوێبیست بوونی ئەو حەفتا (٧٠) کەسە بۆ کەلامی خوا، کاتێك مووسا لەگەڵ خۆی بردن؟ بەڵام بە بۆچوونی بەندە پێویست بەوە ناکات خۆمان زۆر بـەوەوە مشـەوەش بکەین، چونکە ئەو ڕستەیە دوو واتـای هـەن:

١ – دەگونجێ ڕاستەوخۆ گـوێیان لـە کـەلامی خـوا بووبـێ، وەك چـۆن مووسـا گوێی لـێبووە، کە مـن پـێم وایـە ئـەوە تایبـەت بـووە بـە مووسـاوەو ﷺ ئـەو حەفتـا (٧٠) کەسـە کە لەگـەڵ خۆی بردوون، پێم وانیە گوێیـان لـە کەلامو لـە فەرمایشتی خوا بووبێ، بـەڵام دیـارە مووسـایان بینیـوە کـە گـفتوگـۆی لەگـەڵ خـوادا کـردوە.

٢ – جۆری دووەمی گـوێ بیست بوونی کەلامی خوا، ئەوەیە کە ناڕاستـەوخۆیەو ئـەوەش خـوا لـە قورئانـدا باسـی کـردوە، وەك لـە سـووڕەتی (التوبـة)دا دەفـەرموێ: ﴿ وَإِنۡ أَحَدٞ مِّنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ ٱسۡتَجَارَكَ فَأَجِرۡهُ حَتَّىٰ يَسۡمَعَ كَلَٰمَ ٱللَّهِ ثُمَّ أَبۡلِغۡهُ مَأۡمَنَهُۥۚ ...﴿٦﴾ ﴾التوبة، واتە: ئەگـەر یەکێك لە هاوبەشدانەرەکان پەنای بۆ تـۆ هێناو داوای کرد کە لە پەنای تۆ دابێ، پەنای بدە تاکو گوێی لـە فەرمایشتی خوابێ، ئنجا ئایا لە کوێـوە گوێی لێبـێ؟ بێگومـان لـە پێغەمبـەرو لە هاوەڵانییەوە، کەواتە: کـە دەفـەرموێ: هەندێکـیان گوێیـان لـە فەرمایـشتی خـوا بـووە، دوایـی گۆڕیویانـە، واتـە: لـە مووسـاوە گوێیـان لێبـووە یـاخود لـە زاناکانـەوە گوێیـان لـێبووە، بـەڵام دوایـی گـۆڕیویانەو مـەرج نیـە ڕاسـتەوخۆ گوێیان لـێ بووبـێ !.

**مەسەلەی سێیەم:** گۆڕین (تحریف)ی کتێبـی خواو کەلامی خوا، دوو جۆری هەیـەو بە دوو جۆر فەرمایشـتو کـەلامو کـتێبـی خوا دەگـۆڕدرێ:

**گۆڕینی یەکەم/** گـۆڕینی ڕواڵەتیـیو بێژەیی، یانی کە وشـەو بێژە (لفظ)ەکانی بگـۆڕێن، وەك خـوای پەروەردگـار دەربـارەی جوولەکەکـان دەفـەرموێ: ﴿ ... يُحَرِّفُونَ ٱلۡكَلِمَ عَن مَّوَاضِعِهِۦ...﴿١٣﴾ ﴾ المائدة، واتە: وشـەکـان لە شوێنی خۆیان دەگۆڕن...، وەك چۆن سیفەتەکانی پێغەمبەریان ﷺ گۆڕیوە.

**گۆڕینی دووەم/** گۆڕینی مەعنەوییـە، ئـەویش ئەوەیـە بـە شـێوەیەك مەبەسـتو مانای لێکبدرێتەوە، کە لەگەڵ ئایەتەکە نەگونجێ، زۆرێك لـە مـسوڵمانانیش لەرێـی (تـأویل)ەوە {واتە: (تـأویل)ێك کە دەقە شـەرعییەکە هەڵـێنـەگرێت}

کە جۆرێك بووە لە گۆڕین (تَحـْرِيف) هێناویانەتە نێو هەندێك لە دەقەکانی قورئانو سوننەتەوە، دەقەکانی ئیسلامیان گۆڕیون.

**مەسەلەی چوارەم:** گوتمان وشەی (أماني) بە سێ واتا دێت :

أ) هەم بە مانای خوێندنەوەی ڕووکەش.

ب) هەم بە مانای درۆو ئەفسانە.

ج) هەم بەمانای خۆزگە خواستنو خەیاڵ پڵاو دێت.

ئنجا دیارە مسوڵمانیش کەمو زۆر بەشیان هەیە لەو (أماني)یەدا، بۆیە خوای کاربەجێ لە سووڕەتی (النساء)دا دەفەرموێ: ﴿ لَّيۡسَ بِأَمَانِيِّكُمۡ وَلَآ أَمَانِيِّ أَهۡلِ ٱلۡكِتَٰبِۗ مَن يَعۡمَلۡ سُوٓءٗا يُجۡزَ بِهِۦ ...﴿١٢٣﴾ ﴾، واتە: نە بە خەیاڵ پڵاوی ئێوەیە، {لێرەدا (أُمنية) بەمانای خۆزگەو خەیاڵ پڵاوە}، نە بە خەیاڵ پڵاوی خاوەن کتێبانیشە، واتە: هەرکەسێك خراپە بکات سزای دەدرێتەوە، یانی: ئەوەنیە کە ناوت لە خۆتنا مسوڵمان، تازە هەر بەناوی مسوڵمان لە حەوت ئاوان بپەڕیەوە، یان کە ناوت لە خۆت نا ئیسلامیی، هەر لەبەر ئەوەی کە بەناو ئیسلامیی، تازە خۆت پێ لە خەڵك چاکتربێ! دەبێ ئیمانت باشتر بێتو، تێگەیشتنت چاکتربێو، کردەوەت باشتربێو، عیبادەتت ساغترو، ڕەوشتت بەرزتر بێت، ئنجا لە خەڵکی چاکتر دەبی، ئەگەرنا تەنیا بە ناولەخۆنان، گۆڕانت بەسەردا نایەت.

**مەسەلەی پێنجەم:** وشەی (ظَّنّ) باسمان کرد کە بە زۆریی بە مانای: (گومان)ە، بەڵام جاری واهەیە بەمانای عیلمو یەقین دێت، خوای زاناو توانا دەربارەی ئەهلی کیتاب دەفەرموێ: ﴿ ... وَإِنۡ هُمۡ إِلَّا يَظُنُّونَ ﴿٧٨﴾ ﴾ البقرة، واتە: وە تەنیا گومان دەبەن، کەواتە: گومان بردن بەس نیە بۆ بناغەی دینداریی، بۆیە زانایانی ئیسلام گوتوویانە: لە بواری ئیمانو عەقیدەدا ئینسانی مسوڵمان دەبێت بگاتە یەقینو دەبێت عیلمی هەبێت، دروست نیە بڵێ: من دەزانم خوا

هەیە، چونکە فلاّن مامۆستا، یان فلاّن کەس وادەڵێ، یان دەزانم فریشتە هەن، چونکە لە فلاّن کتێبدا وادەڵێ ! بەڵکو دەبێ خۆت بگەیە دڵنیایی و بڵێی دەزانم: فریشتەکان هەن، چونکە خوای پەروەردگار لە قورئاندا، وا دەفەرموێ، وە منیش بۆم ئیسپات بووە کە قورئان کتێبی، خوایە چونکە موعجیزەی پێغەمبەرە ﷺ ئاوا بەم شێوەیە، ئەگەرنا لە مەسەلەی ئیمان و عەقیدەدا شوێن گومان کەوتن و تەقلید دروست نیەو، دەبێ ئینسان خۆی بگاتە یەقین و عیلم، چونکە خوا ڕەخنەی لە ئەهلی کتاب گرتوە دەفەرموێ: ﴿ وَإِنْ هُمْ إِلَّا يَظُنُّونَ ﴾، تەنیا گومان دەبەن، کەواتە: دروست نیە لەسەر بناغەی گومان بەدوای دین بکەوی و دەبێ لەسەر بناغەی عیلم و یەقین بەدوای بکەوی، وەك خوا ﷻ بە پێغەمبەری خۆی (محمد) ﷺی فەرمووە: ﴿ فَاعْلَمْ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱللَّهُ ...﴿١٩﴾ ﴾محمد، واتە: دەجا بزانە، کە جگە لە خوا هیچ پەرستراو نین !

**مەسەلەی شەشەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ فَوَيْلٌ لِّلَّذِينَ يَكْتُبُونَ ٱلْكِتَٰبَ بِأَيْدِيهِمْ ثُمَّ يَقُولُونَ هَٰذَا مِنْ عِندِ ٱللَّهِ ﴾، خوا ﷻ سزای سەختی بۆ بڕیار داون، وەك فەرموویەتی: ﴿ فَوَيْلٌ لَّهُم مِّمَّا كَتَبَتْ أَيْدِيهِمْ وَوَيْلٌ لَّهُم مِّمَّا يَكْسِبُونَ ﴾، سزای سەخت بۆوان لە بەرانبەر ئەوەدا، کە دەستیان دەینووسی، وە سزای سەخت بۆوان، لە بەرانبەر ئەوەدا کە وەدەستیان دەهێنا، لێرەدا دوو شتمان دەستگیر دەبن :

**یەکەم/** هەرکەسێك شتێك دەڵێ بەناوی دینەوە، یان شتێك دەنووسێ، دەبێ زۆر دڵنیابێ و هەوڵبدات، تێگەیشتنێکی ڕاست و دروستی لەوبارەوە هەبێ، بۆ وێنە: دەبێ هیچ کاتێك فەرمایشتێك تا ساغی نەکاتەوە کە هی پێغەمبەرە ﷺ، یەکسەر نەڵێ هی پێغەمبەرە، هەروەها لە خۆوە شتێك پاڵنەداتە لای ئیسلام، تا تەواو دڵنیا نەبێ کە هی ئیسلامە.

دووەم/ وە بۆ تێگەیشتنەکەش دەبێ بڵێ: ئەوە تێگەیشتنی منە دەربارەی ئیسلام، وە دەبێ هەوڵیش بدات تێگەیشتنەکەی بە بەڵگەوە بخاتەڕوو و هەروا لەخۆوە قسە نەکات.

**مەسەلەی حەوتەم:** ئەوە کە خوا ﷻ باسی کەسب و وەدەستهێنان دەکات ﴿ وَوَيۡلٞ لَّهُم مِّمَّا يَكۡسِبُونَ ﴾، پاش ئەوەی باسی کتێب نووسین دەکات، ئەوەی لێوەردەگیرێ کە هەمیشە گۆڕینی دین بەرژەوەندیی دنیای لە پشتەوەیەو، وە وەك کارو کەسابەت بەکاردەهێنرێ، ئێستا تەماشا بکە: لەسەر کەناڵێکی ئاسمانیی، یان لە ڕۆژنامەیەکدا، یان لە گۆڤارێکدا مەلایەکی دین فرۆش، کە سەر بە حیزبێکی عەلمانییە فەتوا دەدا، شت دەڵێ شت دەنووسێ، بۆخۆشی دەزانێ درۆ دەکاتو ئیسلام وانیە، بەڵام بۆ ڕازیکردنی ئەو لایەنەی مووچەی پێدەدا، ئەوە دەڵێ، هەربۆیەش خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ وَوَيۡلٞ لَّهُم مِّمَّا يَكۡسِبُونَ ﴾، وە سزای سەخت بۆوان لە بەرانبەر ئەو کەسابەتەدا کە دەیکەن، ئایا کەسابەت نەماوە بیکەن دین فرۆشتن نەبێ؟ بابچێ بۆخۆی سەوزە فرۆشیی بکات[1]، بابچێ بەرگدروویی بکات، بابچێ کرێکاریی بکات، هەر کەسابەتێ بکات باشترە لەوە کە دینی خوا بفرۆشێ.

(القُرطُبي) لەبارەی کەسابەتکردن بە گۆڕینو دەستکارییکردنی دەقەکانی دینەوە، دەڵێ: {(وكَانت للأحبار والعُلَمَاء رِيَاسَة ومَكاسِبُ فخافُوا إنْ بَيَّنوا أَنْ تذهَب مآكلهم ورياسَتُهم فَمِن ثَمَّ غَيَّرو) (الجامع لإحكام القُرآن، ج: (٢)، ص: (١٠)}، واتە: زاناکانی جوولەکەو شارەزاکانیان، سەرۆکایەتییان هەبوو، وە دەستکەوتوماڵێکیان هەبوو، ترسان ئەگەر ئەو حەقیقەتانە ڕوونبکەنەوە (بڵێن: موحەممەد پێغەمبەری خوایەو پێغەمبەری کۆتاییە) ئەو خواردنو

---

١) مەبەستم سادەییو ئاسانیی ئەمجۆرە کاروکاسبییانەیە کە بە هەموو کەس دەکرێنو بە سێنایی دەستگیر دەکرێن، نەك بە کەم سەیرکردنی سەوزەفرۆشو بەرگدرووو کرێکار، خۆیشم ماوەیەك میوەفرۆشییو کرێکارییم کردوە!

سەرۆکایەتییەی دەستیان کەوتبوو، لەدەستیان بچێ، بۆیە گۆڕییان چونکە ئەگەر پێشتر سەرۆك‌و زاناو پێشەوا بوون، ئەو کاتە دەبوونە مسوڵمانێکی سادە، وەك باقی مسوڵمانان‌و ئەو بەرژەوەندییەیان لەدەست دەچوو، بۆیە کە ترسان لەوەی کە ئەو پاروەو چەورو خواردنەیان لەدەست بچێ، هەڵسان تەوراتیان گۆڕی، بەجۆرێك کە لەگەڵ بەرژەوەندیی ئەواندا بێتەوە، نەك لەگەڵ بەرژەوەندیی دنیاو قیامەتی ئەو خەڵکە، وە هەر کەسێکیش کە دین دەگۆڕی حەتمەن بە بارێکدا دەیگۆڕێ، کە لەگەڵ بەرژەوەندیی دنیای ئەوداو، ئەو دەسەڵاتەدا کە ئەو پارەی لێوەردەگرێ‌و چاوی لەدەستیەتی بگونجێ، شایانی باسیشە ئەوانەی کە ئایینی خوا دەگۆڕن، وەك لە دەرسەکانی داهاتوودا دەیگەینێ، گەورەترین گوناح دەکەن، وە گەورەترین سزاشیان هەیە.

**مەسەلەی هەشتەم:** کە دەفەرموێ: ﴿وَقَالُوا۟ لَن تَمَسَّنَا ٱلنَّارُ إِلَّآ أَيَّامًا مَّعْدُودَةً﴾، خوا ﷻ دوو شتیان پێ دەفەرموێ، فەرموویەتی: ﴿قُلْ أَتَّخَذْتُمْ عِندَ ٱللَّهِ عَهْدًا﴾، ئایا پەیمانتان لە خوا وەرگرتوە؟ ﴿فَلَن يُخْلِفَ ٱللَّهُ عَهْدَهُۥٓ﴾، بەتەئکید خوای پەروەردگار پەیمانی خۆی ناشکێنێ، ﴿أَمْ تَقُولُونَ عَلَى ٱللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ﴾، یاخود شتێك دەڵێن: بەناوی خواوە کە نایزانن؟ دیارە پەیمانیان لە خواوە نیە، دەنا پێشانیان دەدا، کەواتە: درۆ دەکەن، واتە: خوا ﷻ زۆر لە ڕێیەکی کورتەوە دەمکوتی کردوون، ئنجا ئەمە ئەوەش دەگەیەنێ، کە بەڕاستی ئەفسانە هەڵبەستن‌و درۆکردن بەناوی دینەوە، زەربەیەکی گەورە لە ئایین دەدا زۆری ناشیرین دەکات، وە ئەهلی دینیش دزێو دەکات، شایانی باسیشە خوا لە سوورەتی (آل عمران)دا، باسی هەمان مەسەلە دەکات، چونکە قورئان هەندێکی هێندێکی ڕوون دەکاتەوە، دەفەرموێ: ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ نَصِيبًا مِّنَ ٱلْكِتَٰبِ يُدْعَوْنَ إِلَىٰ كِتَٰبِ ٱللَّهِ لِيَحْكُمَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ يَتَوَلَّىٰ فَرِيقٌ مِّنْهُمْ وَهُم مُّعْرِضُونَ ﴿٢٣﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَالُوا۟ لَن تَمَسَّنَا ٱلنَّارُ إِلَّآ

أَيَّامًا مَّعْدُودَاتٍ وَغَرَّهُمْ فِي دِينِهِم مَّا كَانُوا يَفْتَرُونَ ﴿٢٤﴾ فَكَيْفَ إِذَا جَمَعْنَاهُمْ لِيَوْمٍ لَّا رَيْبَ فِيهِ وَوُفِّيَتْ كُلُّ نَفْسٍ مَّا كَسَبَتْ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴿٢٥﴾ ﴾،

واتە: تەماشای ئەوانە ناکەی کە بەشێك لە کتێبی خوایان پێ دراوە، بانگ دەکرێن بۆلای کتێبی خوا کە (مەبەست قورئانە) بۆ ئەوەی حوکمیان لە نێواندا بکات، بەڵام هەندێکیان پشت هەڵدەکەنو ڕوو وەردەگێڕن، ئەویش بەهۆی ئەوەوە کە گوتیان: چەند ڕۆژێکی کەم نەبێ ئاگرمان تووش نابێ، وە لە دینداریيەکەیاندا ئەوەی کە هەڵیانبەستبوو (ئەو شتانەی کە هەڵیانبەستوەو بە درۆو دەلەسە ڕێکیان خستوە) ئەوە فریویدانو ماڵی وێران کردن، تۆ تەماشای زۆر لە مسوڵمانان بکە: تووشی شیرك دەبن، تووشی بیدعەت دەبن، تووشی هەڵخەڵەتان دەبن، تووشی شوێنکەوتنی ڕێچکەی خوارو پیاوی بێ بارو ناهەموار دەبن، بەهۆی چییەوە؟ بەهۆی حاڵی نەبوونەوە، لە ئەنجامی گۆڕان (تحریف)ی دیندا ! دینیان لێ گچکە کراوەتەوە لە نوێژو ڕۆژوودا، دینیان لێ بچووك کراوەتەوە لە پەیوەندی نێوان ئینسانو خوادا، وەك دینی شێوێنلراوی نەصرانیی، بۆیە ئەم دین لێ تەنگکرانو دین لێ دەستکارییکرانو بچووککرانەوەیە، ڕێی لەبەردەمدا ئاچوخ کردوون، کە ببنە عەلمانییو بچنە نێو حیزبێك، کە بەرنامەکەی دژو پێچەوانەی بەرنامەی خوایە، بەڕاستی سەیرە بابایەك ڕیشی خۆی لەمست کەسێك بنێ کە دژی خواو پێغەمبەرەکەیەتی، کەچی خۆشی هەر بە مسوڵمان دەزانێ !

لەبەرچی؟ چونکە خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ ...وَغَرَّهُمْ فِي دِينِهِم مَّا كَانُوا يَفْتَرُونَ ...﴿٢٤﴾ ﴾ آل عمران، وە ئەو درۆو دەلەسەیەی کە لە دینەکەیاندا کردیان، هەڵیخەڵەتاندنو کڵاوی لەسەرنان، هەڵبەتە دەستکارییکرانو گۆڕاینی ئایین، هەمیشە وادەکا کە خەڵك بەو شێوەیە کڵاوی بچێتە سەرو چەواشە بکرێو، تووشی سەرگەردانیی ببێ، بۆیە دوایی خوا دەفەرموێ: ﴿ فَكَيْفَ إِذَا

جَمَعۡنَٰهُمۡ لِيَوۡمٖ لَّا رَيۡبَ فِيهِ ...﴿٢٥﴾ ﴾ آل عمران، جا چی دەکەن ئەگەر کۆمان کردنەوە بۆ ڕۆژێك کە هیچ گومانی تێدانیە، ﴿ ...وَوُفِّيَتۡ كُلُّ نَفۡسٖ مَّا كَسَبَتۡ وَهُمۡ لَا يُظۡلَمُونَ ﴿٢٥﴾ ﴾ آل عمران، واتە: وە هەر کەسە سزای پڕ بە پێستی خۆی دراو پاداشتی خۆی درایەوە، بێئەوەی کە ستەمیان لێبکرێ.

**مەسەلەی نۆیەم:** مەبەست لە ﴿ مَن كَسَبَ سَيِّئَةٗ وَأَحَٰطَتۡ بِهِۦ خَطِيٓـَٔتُهُۥ ﴾، ئینسانی کافرە، لەبەرچی؟ وشەی (سَيِّئَةٗ) بەمانای گوناح دێت، ئەو کەسەی گوناهی وەدەست هێناوە، وە هەندێك لە زانایان گوتوویانە: لێرەدا مەبەست لە: (سَيِّئَةٗ) شیرکە، بۆچی وایانگوتوە؟ چونکە: خوا ﷻ دوایی فەرموویەتی: ئەوانە جێگایان دۆزەخەو بە هەمیشەیی تێیدا دەمێننەوەو، لەسەر گوناهیش ئینسان بە هەمیشەیی لە دۆزەخدا نامێنێتەوە، کەواتە: مەبەست پێی شیرك‌و کوفرە، بەڵام لە ڕاستیدا وشەی: (سَيِّئَةٗ) بەمانای گوناهو تاوانە، بەڵام ئەوەی بۆمان دەردەخات کە مەبەست لێرەدا ئینسانی کافرە، ئەوە ڕستەی دواییە، کە دەفەرموێ: ﴿ وَأَحَٰطَتۡ بِهِۦ خَطِيٓـَٔتُهُۥ ﴾ گوناهەکەی ئابڵووقەو گەمارۆی داوەو، هەرچوار دەوری لێگرتوە، واتە: نوقم بووە لە گوناهاندا، هەڵبەتە ئینسانی ئیماندار یەك تۆز (مثقال) ئیمانی پێبێ، لە گوناهاندا نوقم نابێ‌و، حەتمەن تۆزێ چاکەی هەردەبێ‌و لە گوناهاندا نوقم نابێت، وەك پێغەمبەر ﷺ لە فەرمایشتێکدا فەرموویەتی: {إِنَّ الْعَبْدَ إِذَا أَخْطَأَ خَطِيئَةً نُكِتَتْ فِي قَلْبِهِ نُكْتَةٌ سَوْدَاءُ، فَإِذَا هُوَ نَزَعَ وَاسْتَغْفَرَ وَتَابَ سُقِلَ قَلْبُهُ، وَإِنْ عَادَ زِيدَ فِيهَا حَتَّى تَعْلُوَ قَلْبَهُ، وهُوَ الرَّانَ الَّذي ذَكَرَ اللهُ ﴿ كَلَّاۖ بَلۡۜ رَانَ عَلَىٰ قُلُوبِهِم مَّا كَانُواْ يَكۡسِبُونَ ﴿١٤﴾ ﴾ المطففين، (رَوَاهُ التِّرمِذِيُّ برقم: (٣٣٣٤)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٢٧٨٧)، وحَسَّنَهُ الأَلبانِي في (سُنَن التِّرمِذِيّ)}، واتە: بەندە کە

گوناهێکی کرد، خاڵێکی ڕەش لەسەر دڵی پەیدا دەبێت، جا ئەگەر وازیهێناو داوای لێبوردنی کرد، دڵی سپی دەبێتەوە، وە ئەگەر گوناهەکانی بەردەوام بوون خاڵە ڕەشەکان بەردەوام دەبن، هەتا دەبێتە ژەنگ بەسەر دڵییەوەو تەواو کەمرەی لەسەر دەبەستێ، ئەویش ئەوەیە کە خوا باسیکردوە: ﴿ كَلَّا بَلْ رَانَ عَلَىٰ قُلُوبِهِم مَّا كَانُوا يَكْسِبُونَ ﴿١٤﴾ ﴾ المطففين، واتە: نەخێر ڕاست ناکەن، بەڵکو دڵیان بە هۆی گوناهەکانەوە کەمرەی بەستوەو ژەنگی هێناوەو یەکجاریی دڵیان داخراوە، ئنجا کە لێرەش دەفەرموێ: ﴿ وَأَحَاطَتْ بِهِۦ خَطِيٓـَٔتُهُۥ ﴾، واتە: گوناهەکانی گەمارۆیانداوەو تێیاندا نوقم بووە، دیارە بابای وا هیچ ئیمانی پێ نیە.

**مەسەلەی دەیەم:** کە دوایی خوا ﷻ باسی ئەهلی ئیمان دەکات دەفەرموێ: ﴿ وَالَّذِينَ ءَامَنُوا وَعَمِلُوا الصَّـٰلِحَـٰتِ أُولَـٰٓئِكَ أَصْحَـٰبُ الْجَنَّةِ هُمْ فِيهَا خَـٰلِدُونَ ﴿٨٢﴾ ﴾، بەڵام ئەوانەی ئیمانیان هێناوە (بە هەموو ئەو شتانەی کە پێویستە ئیمانیان پێ بهێنرێ)، وە هەرچی کردەوەی چاکە بەپێی توانای خۆیان ئەنجامیان داوە، ئەوانە هاوەڵی بەهەشتن و بە هەمیشەیی تێیدا دەمێننەوە، لێرەدا خوا ﷻ بنچینەیەکی بۆ داناوین بۆ پێناسەی بێبڕواو بڕوادار، کە: هەرکەسێ هێندە گوناهان بکات کە گوناهەکانی گەمارۆی بدەن و، وەك کرمی ئاوریشم کە دەچێتە نێو قۆزاخەو خۆی تێدا خپ بکات و لە زەلکاوی گوناهاندا نوقم بێ، ئەوە جێگای دۆزەخە بەهەمیشەیی تێیدا دەمێنێتەوە، جا هەرکەسێك بێ، ئەگەر گریمان خۆیشی بە مسوڵمان دانابێ، هەرکەسێك بێ مادام لە گوناهاندا نوقم بووبێ، دیارە هیچ ئیمانی پێ نیە.

وە هەرکەسێك ئیمانی هەبێ بە هەموو ئەو شتانەی کە پێویستە ئیمانیان پێ بهێنرێ، چونکە کە باسی ئیمان دەکات، دەفەرموێ: ﴿ ءَامَنُوا ﴾، ئیدی نافەرموێ ئیمانیان بەچی هێناوە؟ بۆ ئەوەی کە ئیمان بە خوا (جلَّ شَأْنُهُ)،

بە فریشتەكانی، بە كتێبەكانی، بە پێغەمبەرانی، بە ڕۆژی دوایی، بە هەموو ئەو شتانەی كە پێویستە ئیمانیان پێ بهێنرێ، بگرێتەوە، ئەویش بەو پێناسەیەی كە قورئانو سوننەت باسیان كردوە، كە ئیمان بریتیە لەو حەقیقەتە كە بە عەقڵ وەك زانیاریو تێگەیشتن ئیستیعاب بكرێو بە دڵ قبووڵ بكرێو خۆشبویستریو وەربگیرریو بە زمان دانی پێدابهێنرێو، بە ئەندامەكانیش جێبەجێ بكرێ، وەك زانایانی پێشین ئیمانیان ئاوا پێناسە كردوەو گوتوویانە: (الإِيْمَان: قَوْلٌ وعَمَلٌ قَولُ القَلْبِ واللّسَانِ وعَمَلُ القَلْبِ والجَوَارِح)، واتە: ئیمان قسەیەو كردەوەیە، قسەی دڵو قسەی زمان، وە كردەوەی دڵو كردەوەی ئەندامەكان، قسەی دڵ بریتیە: لە زانینو بەڕاست زانین (المَعْرِفَة والتصدِيق)، قسەی زمانی بریتیە لە دانپێهێنانو، كردەوەی دڵ بریتیە لە قبوولكردنی هەرشتێك كە خوای پەروەردگار فەرموویەتیو پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی قەبووڵت بێو خۆشتبوێو بۆی تەسلیم بی، وە كردەوەی ئەندامەكانیش ئەوەیە كە جێبەجێی بكەی، بەڵێ خوا ﷻ لێرەدا بنچینەیەكی گشتی داناوە، بەپێی ئەو بنچینەیە دەزانین كە ئەو جوولەكانە ڕاست ناكەن كە بەبێ ئیمانو كردەوەی باش بەتەمای بەهەشتن، لەسەر بناغەی هەندێك قسەی درۆو ئەفسانەیی، هەروەها مسوڵمانانێكیش كە وەك جوولەكە خەیاڵ پڵاو دەكەن، ئەوانیش دیسان ڕاست ناكەن، چونكە مسوڵمانیش هەیە كە لە قورئانو سوننەت دووركەوتۆتەوەو بەتەمای شەفاعەتی شێخێك لەخۆی گەڕاوە، یان بەتەمای شەفاعەتی پێغەمبەر ﷺ لەخۆی گەڕاوەو، ڕەنگە ئیمانیشی هەرنەبێ، لە حاڵێكدا كە پێغەمبەری خوا ﷺ، وە فریشتەكانو ئەوانەی كە شەفاعەت دەكەن، بەبێ ئیزنی خوا شەفاعەت ناكەن، وەك فەرموویەتی: ﴿ ... مَن ذَا ٱلَّذِى يَشْفَعُ عِندَهُۥٓ إِلَّا بِإِذْنِهِۦ ... ﴿٢٥٥﴾ ﴾ البقرة، وە شەفاعەت بۆ كەسانێك ناكەن، كە خوا لێیان ڕازی نەبێ، وەك فەرموویەتی: ﴿ ... وَلَا يَشْفَعُونَ إِلَّا لِمَنِ ٱرْتَضَىٰ .. ﴿٢٨﴾ ﴾ الأنبياء، دیارە خواش لە

ئینسانی ئیماندار نەبێ ڕازی نابێ، کەواتە: کەسێك ئیمانی نەبێت پێغەمبەریش شەفاعەتی بۆ ناکات. ئەوە بەنسبەت ئیمان، بەنسبەت کردەوەی چاکیش، دەبێت دوو پایەی سەرەکی هەبێت:

یەکەم: ئەو کردەوەیە دەبێ موافقی شەرع بێت و لە چوارچێوەی شەرع دەرنەچێت.

دووەم: دەبێ بۆ خوابێ و بەشی غەیری خوای ڕەگەڵ نەخرابێ، بە واتایەکی دی: هەم (إتّباع)ی تێدابێ، هەم (إخلاص)، (إتّباع) ئەوەیە کە تێیدا شوێنی شەرع کەوتبی، وە (إخلاص) ئەوەیە کە نیازو مەبەستەکەت بۆ خوا ساغ و یەکلا کردبێتەوە بەشی غەیری خوات ڕەگەڵ نەخستبێ.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی شازدەیەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان لە ئایەتی (٨٣ تاکو ٨٦) دەگرێتە خۆی، لەم چوار (٤) ئایەتەدا، خوا ﷻ باسی ئەو پەیمانە دەکات، کە لە وەچەی ئیسرائیلی وەرگرتوە، وە باسی بڕگەکانی ئەو پەیمانە دەکات، وە باسی شکاندنی ئەوان دەکات بۆ ئەو پەیمانە، وە باسی ئەوە دەکات کە وەچەی ئیسرائیل هەرشتێك لە کتێبو شەریعەتی خوا کە بۆی ناردوون، ئەگەر لەگەڵ بەرژەوەندییاندا بگونجابا پێوەی پابەند دەبوون، وە هەر شتێکیش لەگەڵ بەرژەوەندیەکانییاندا تێکگیرابا، کوفریان پێدەکرد، وە سزای ئەو کوفرەیان دەخاتەڕوو.

﴿ وَإِذْ أَخَذْنَا مِيثَٰقَ بَنِيٓ إِسْرَٰٓءِيلَ لَا تَعْبُدُونَ إِلَّا ٱللَّهَ وَبِٱلْوَٰلِدَيْنِ إِحْسَانًا وَذِي ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْيَتَٰمَىٰ وَٱلْمَسَٰكِينِ وَقُولُوا۟ لِلنَّاسِ حُسْنًا وَأَقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُوا۟ ٱلزَّكَوٰةَ ثُمَّ تَوَلَّيْتُمْ إِلَّا قَلِيلًا مِّنكُمْ وَأَنتُم مُّعْرِضُونَ ﴿٨٣﴾ وَإِذْ أَخَذْنَا مِيثَٰقَكُمْ لَا تَسْفِكُونَ دِمَآءَكُمْ وَلَا تُخْرِجُونَ أَنفُسَكُم مِّن دِيَٰرِكُمْ ثُمَّ أَقْرَرْتُمْ وَأَنتُمْ تَشْهَدُونَ ﴿٨٤﴾ ثُمَّ أَنتُمْ هَٰٓؤُلَآءِ تَقْتُلُونَ أَنفُسَكُمْ وَتُخْرِجُونَ فَرِيقًا مِّنكُم مِّن دِيَٰرِهِمْ تَظَٰهَرُونَ عَلَيْهِم بِٱلْإِثْمِ وَٱلْعُدْوَٰنِ وَإِن يَأْتُوكُمْ أُسَٰرَىٰ تُفَٰدُوهُمْ وَهُوَ مُحَرَّمٌ عَلَيْكُمْ إِخْرَاجُهُمْ ۚ أَفَتُؤْمِنُونَ بِبَعْضِ ٱلْكِتَٰبِ وَتَكْفُرُونَ بِبَعْضٍ ۚ فَمَا جَزَآءُ مَن يَفْعَلُ ذَٰلِكَ مِنكُمْ إِلَّا خِزْيٌ فِي ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۖ وَيَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ يُرَدُّونَ إِلَىٰٓ أَشَدِّ ٱلْعَذَابِ ۗ وَمَا ٱللَّهُ بِغَٰفِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ ﴿٨٥﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ ٱشْتَرَوُا۟ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا بِٱلْءَاخِرَةِ ۖ فَلَا يُخَفَّفُ عَنْهُمُ ٱلْعَذَابُ وَلَا هُمْ يُنصَرُونَ ﴿٨٦﴾ ﴾

## مانـای وشـە بە وشـەی ئایەتەكـان

((وە یادبكەنەوە (ئەی وەچەی ئیسرائیل) كاتێك پەیمانی وەچەی ئیسرائیلمان وەرگرت (واتە: كاتی خۆی لە سەردەمی مووسادا) كە: جگە لە خوا ناپەرستن، وە چاكە لەگەڵ باب‌و دایك‌و خزمان‌و هەتیوان‌و نەدارانـدا دەكەن، وە قسەی چاك بە خەڵكی بڵێن‌و نوێژ بەرپا بكەن‌و زەكات بدەن، پاشـان جگە لە كەمێكتان سەرپێچییتان كـردو پشتتان تێكـرد ﴿٨٣﴾ وە یادبكەنـەوە كاتێك پەیمانتانمان وەرگرت، كە خوێنی خۆتـان نارێـژن‌و خۆتـان لـە مـاڵ‌و حاڵتان وەدەرنـانێن، پاشان دانتـان پێداهێنـا، وە ئێوە لەوبارەوە شایەدن ﴿٨٤﴾ كەچی هەر ئێوەو مانـانن كە خۆتـان دەكوژن‌و كۆمەڵێكتان لـە ماڵ‌و حاڵیان وەدەردەنێن، وە بـە گونـاهو دەستدرێژیی پشتی دوژمن دەگرن لە بەرانبەریانـدا، بەڵام ئەگەر بەدیلـی بێنـە لاتـان فەرەبوویان بۆ دەدەن، لـە حاڵێكدا كـە دەركردنیشیان هـەر لێتـان قەدەغـە كرابوو (وەك هێشتنەوەیان بە دیلیی) جـا ئایـا بـڕوا بە هەندێك لە كتێب دێنن‌و كوفـریش بـە هەنـدێكی دەكـەن؟ دیـارە هەركەسێكتان ئـەوە بكـات، جگـە لـە سەرشـۆڕیی لـە ژیـانی دنیـادا سـزایەكی دیكـەی نیـە، وە ڕۆژی هەڵسـانەوەش دەگێڕدرێنـەوە بۆ توندتـرین ئازار، وە خـوا بێ ئاگـا نیـە لـەوەی كـە دەیكـەن ﴿٨٥﴾ وە ئەوانـە كەسانێكـن بـە دوارۆژ ژیـانی دنیایـان كڕیـوە، بۆیـە ئازاریـان لەسـەر سـووك ناكرێ‌و سەریش ناخرێن ﴿٨٦﴾)).

## شـیكردنـەوەی هەندێـك لە وشـەكان

(**حُسْنًا**): (الحُسْنُ: عِبَارَة عَن كُلّ مُبهِجٍ مَرغُوبٍ فِيهِ)، واتـە: (حُسْن) بریتیـە لە هەر شتێكی دڵخۆشكەر، كە خەڵك بۆی ئارەزوومەنـدبێ، كەواتـە: ﴿ وَقُولُوا لِلنَّاسِ حُسْنًا ﴾، واتە: قسەیەك بكەن بـاش بێ‌و چاك بێ بەكەڵك بێت.

(**تَوَلَّيْتُمْ**): (التَوَلِّي: إذَا عُدِّيَ بِنَفسِهِ اقتَضَى مَعنَى الوَلاَيَة، وإذَا عُدِّيَ بـ(عَن) لَفظَاً أو تَقدِيرَاً اقتَضَى مَعنَى الإعْرَاضِ وتَرْكِ قُربِه...) وشەی (تَوَلِّي)، ئەگەر تەعەددا بکا بۆ (مَفْعُول) بۆ نەفسی خۆی، ئەوە مانای دۆستایەتیی دەگەیەنێ، بەڵام ئەگەر بە وشە (عن) تەعەددا بکا بۆ (مَفْعُول)، وەك (تَوَلَّى عَنهُ)، ئەوە چ بە (لفظ) وشەی (عن) بەکاربهێنرێ، چ بە تەقدیر مەزەندە بکرێ، مانای پشت هەڵکردن و لامل تێکردن دێ.

(**مُّعْرِضُونَ**): لە (عُرْض)ەوە هاتوە، (العُرْضُ: خِلاَفُ الطُّولِ والعُرْضُ خُصَّ بالجَانِبِ)، (عُرْض)، واتە: پانایی، وە پێچەوانەی درێژییە، وە بەمانای لاتەنیشتیش دێ، کەواتە: (أَعْرَضَ عَنهُ)، واتە: تەنیشتی تێکرد، لاملی تێکرد.

(**أَقْرَرْتُمْ**): (الإقْرَار: إِثبَاتُ الشَّيءِ، مِنْ قَرَّ فِي مَكَانِهِ يَقِرُّ قَرَارَاً، إذَا ثَبَتَ ثبُوتَاً جَامِدَاً وَأَصْلُهُ مِنَ القُرِّ وَهُوَ البَرْدُ)، (إقْرَار) بریتییە لەوەی کە شتێك بسەلمێنی و بچەسپێنی، لە (قَرّ)ەوە هاتوە (قَرَّ يَقِرُّ قَرَارَاً) واتە: جێگیربوون، جێگیردەبێ، جێگیربوون، (قَرَّ)یش لە ئەسڵدا لە: (قُرّ)ەوە هاتوە، واتە: سەرما، لەبەر ئەوەی لە کاتی سەرمادا شت سەقامگیر دەبێت و ئارام دەگرێ، بەپێچەوانەی گەرما کە بە جمموجۆڵ دەکەوێت.

(**تَشْهَدُونَ**): واتە شایەدیی دەدەن، یاخود ئامادە دەبن، یاخود دەبینن، (مِن الشُّهُودُ والشّهادةُ: الحُضُورُ مَعَ المُشَاهَدَةِ، إمَّا بالبَصَرِ أو البَصِيرَةِ)، واتە: لە (شهُودُ) و (شَهَادة)ەوە هاتوە، کە بەمانای ئامادەبوون دێت لەگەڵ بینیندا، چ بینینی بە چاو، چ بینینی بە عەقڵ، وە: (الشَّهَادَةُ: قَوْلُ صَادِرٌ عَنْ عِلْمٍ حَصَلَ بِمُشَاهَدَةِ بَصِيرَةٍ أو بَصَرٍ) (شَهَادة) بریتییە لە قسەیەك کە دەردەچێ لە کەسێکەوە کە عیلمێکی هەیە، بەهۆی ئەوەوە، کە بەچاو شتی بینیوە، یاخود بە عەقڵ درکی پێکردوە، بۆی پەیدابووە.

(تَظَٰهَرُونَ): واتە پشتیان دەگرن، لە (ظهْر)ەوە هاتوە (الظَّهْرُ: الجَارِحَةُ و جَمْعُهُ ظُهُورٌ، وَظَهَرَ: غَلَبَ وَظَاهرهُ: عَاوَنَهُ)، (ظهْر)، واتە: پشت کە کۆیەکەی (ظهُور)ە، وە (ظَاهَرَهُ)، واتە: هاوکاریی کردو پشتی گرت.

(بِٱلۡإِثۡمِ): واتە: بە گوناح (أَثِمَتِ النَّاقَةُ: أَبْطأَتْ في مَشْيِها) واتە: حوشترەکە ڕۆیشتنەکەی لەسەرخۆ بوو، وە: (الإثمُ والأَثام: اسمٌ للأفعَال المُبطِئَة عَنِ الثَّوَاب) واتە: (إثمُ) و (أَثَام): ناوە بۆ ئەو کردەوانەی کە ئینسان دوا دەخەن لە پاداشت.

(وَٱلۡعُدۡوَٰنِ): لە (العدو)ەوە، هاتوە کە بە مانای تەجاوز تێپەڕاندن دێ.

(أُسَٰرَىٰ): کۆی (أسیر)ە، کە بە (أَسْری)ش کۆدەکرێتەوەو بە (أساری)ش کۆدەکرێتەوە، ئەسڵی (أسیر)یش لە (أَسْر)ەوە هاتوە، کە بە مانای (شدّ) دێت، واتە: گرێدان، دەگوترێ: (شَدَّهُ بالقَدِّ)، واتە: بە چەرم گرێیدا، (قدّ)یش بریتییە لە (أَسار) کە بە زوێڵە چەرمێك دەڵێن لە پێستی کاریلە، یان هەر ئاژەڵێکی دیکە دادەهێنرێ.

(تُفَٰدُوهُمۡ): (الفِدَى والفِدَاءُ: حِفظُ الإنسَانِ عَنِ النائبَة بمَا يَبذلُهُ عَنَهُ) ئەوە کە ئینسان شتێك ببەخشێ بۆ ئەوەی، کە خۆی بپارێزێ ئەو شتە پێی دەگوترێ: (الفِدَى) وە پێشی دەگوترێ: (الفِدَاءُ) وە (إفتدى) واتە: شتێکیدا بۆ ئەوەی کە پارێزراوبێ، واتە: خۆی کڕییەوە، بەڵام (فَدَى)، واتە: شتێکیدا بۆ ئەوەی کە غەیری خۆی پێ بکڕێتەوە، کەواتە: (تُفَٰدُوهُمۡ)، واتە: قەرەبووتان بۆ دابوون بۆ ئەوەی بیانکڕنەوە.

(خِزۡيٌ): دەگوترێ: (خَزِيَ الرَّجُلُ)، واتە: (لَحِقَهُ انْكِسَارٌ) ئەو ئینسانە زەبوونیی و سەرشۆڕیی تووشبوو، وە: (خَزِيَ: ذَلَّ وَهَانَ) واتە: زەبوون و سووك بوو.

(ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا): ژیـانی دنیـا، (الآخِـرُ يُقـابِلُ الأوّل، والـدَار الآخِـرَة هِـيَ النـشَـأة الثـانية والآخـرة أو الـدَار الآخـرة، أي: الحَيَـاةُ الآخـرة أو الـدَار الآخـرة) واتـه: (الآخِر): دوامین، بەرانبەری (الأوّل)ە:یەکەمین وە مەبەست لە (الدَار الآخـرة) مەنزڵگـای دواییـە، ژیـانی دووەمـە، کـە (الآخِرة)شـی بـۆ بەکـاردێو (الحَيَـاةُ الآخرة)شی بۆ بەکـاردێ، واتـە: ژیـانی دوایـی: ئنجا دنیـا بۆیـە پێـی گـوتراوە: دنیا، چونکە (مُؤَنّث)ی (أدْنى)یە، (أدْنـى)ش، واتە: نزیکتـر، چونکە ژیانی دنیا نزیکترە لە ژیانی دواڕۆژ، بە پێچەوانەی (آخرة)، (آخرة) سیفەتی مەوصوفێکی (مَحْذُوف)ە، واتە: (الحياة الآخرة) ژیانی دواتر ژیانی ڕۆژی دوایی.

## هـۆی هاتنـە خوارەوەی ئایـەتەکـان

هـۆی هاتنـە خـوارەوەی ئـەو ڕسـتە قورئانییـەی، کـە دەفـەرموێ: ﴿أَفَتُؤْمِنُونَ بِبَعْضِ ٱلْكِتَـٰبِ وَتَكْفُرُونَ بِبَعْضٍ﴾. {(أخْـرَجَ ابْـنُ جَرِيـر، وَابْـنُ أبِـي حَـاتِم، عَـنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ الله عَنهُما: كَانوا إذَا كَانَ بَيْنَ الأوس والخَزرَج حَربٌ، خَـرَجَ بَنـو قِينـقاعِ مـعَ الخَـزرَج، و بنـو النـضِير وبنـو قرَيظَـة مَـعَ الأوس و ظَـاهَرَ كُلُّ وَاحِدٍ مِنَ الفَـرِيقَينِ حُلَفَـاءَهُ عَلَـى إخوَانـهِ، حَتَّـى سَفكوا دِمَـاءهُم، فَإذَا وَضَعَت الحَـرب أوزَارَهـا، افتدَوا أسراهم تَصدِيقـاً لـمَا فـي التَّورَاة) (فتـح القـدير، ج (١)، ص (١٥٢)، ابـن كـثيـر، ج: (١)، ص: (١٧٨)، مَحَاسِـنُ التأويـل للقـاسمي، ج (٢)، ص (١٨٢)}، واتە: (ابن جرير)و (ابن أبي حاتم) لـە عەبدوڵـڵای کوڕی عەبباسـەوە خـوا لێیـان ڕازی بێ گێڕاویانەتەوە، کە لـە نێوان ئـەوس و خەزرەجدا {کـە دوو تیـرەی کـافر بوون کاتی خۆی لە مەدینە پێش ئەوەی پێغەمبەر ﷺ بچێ ئـەو کاتـەش مەدینـە (یثـرب)ی پێ دەگوتراو، ئەوانە بت پەرست بوون} کە جـەنگیان دەبوو لـە نێـوانی خۆیانـدا (بنـو قینقـاع) {کـە تیـرەیەك بـوون لـە جوولەکـەکانو هاوپـەیمان بـوون لەگـەڵ خەزرەجییەکانـداو}، (بنـو نضیـر) و (بنـو قریظـة) {کـە هاوپـەیمان بـوون لەگەڵ ئەوسـدا} کاتێ ئـەوس و خـەزرەج بـە یەکـەوە شـەڕیان دەبـوو، (بنـو قینقـاع)

یارمـەتی خەزرەجییـەکانیان دەداو (بنـو نـضیر) و (بنـو قریظـة)ش یارمـەتی ئەوسـیان دەدا، وە لـە یەکتـریان دەکوشـت، ئەوانـە هـەر کامێکـیان پـشتی هاوپەیمانـەکانی خۆیانیـان دەگـرت، لـە دژی بـرا دینییـەکانی خۆیـان، وە خـوێنی یەکتـریان دەڕشت {وە یەکتـریشیان لەسەر ماڵو حاڵی خۆیـان دەردەکـرد}، بـەڵام جەنگ کۆتایی دەهات دایکەکانی خۆیانیان (واتـە: جوولەکە بـەدیل گیـراوەکانیان، دەکڕیەوە، وەك کارپێکردنی ئـەوەی کـە لـە تـەورات دا هـاتوە ، بۆیـە خـوا ﷻ ئـەم ئایەتـەی نـاردە خـوارێ، کـە بۆچی بـڕوا بـە هەنـدێ لـە کتێبـی خـوا دەکـەن، کـە جوولەکەکـان ئەگـەر بـە دیـل بگیـرێن قـەرەبوو فیدیـەیان دەدەنو دەیانکڕنـەوە، بەڵام بۆ کوفر بە باقی ئایەتەکانی دیکـەی کتـێبی خـوا دەکـەن، کـە بریتیـە لـەوەی برای دینی خۆتان نەکوژن، وە لە ماڵو حاڵی خۆیان وەدەریان نەنێن، وە هاوکـاریی دوژمن نەکەن لەسەریان ؟!.

## مانـای گـشتی ئـایـەتەکـان

خـوا ﷻ یـەکێکی دیکـە لـە کەموکوڕییـەکانی جوولەکـەکان بـاس دەکـاتو دەفـەرموێ: ﴿ وَإِذْ أَخَذْنَا مِيثَٰقَ بَنِيٓ إِسْرَٰٓءِيلَ لَا تَعْبُدُونَ إِلَّا ٱللَّهَ ﴾، (ئـەی جوولەکەکـان) یادبکەنەوە (وە هەرکەسێ قورئـان دەخوێنـێ بـا یادبکاتـەوە) کـاتێ کە پەیمانمان لە وەچەی ئیسـرائیل وەرگـرت، پەیمانەکەش بـریتی بـوو لـەم دە (١٠) بڕگەیە، کە پێشتـریش ئاماژەمان پێداون:

**بڕگـەی یەکـەم:** ﴿ لَا تَعْبُدُونَ إِلَّا ٱللَّهَ ﴾: بێجگـە لـە خـوا هـیچ شـتێکی دی ناپەرستن، ئـەوە بناغـەی پـەیمانی خوایـە کـە لەگـەڵ هەرکەسێکدا دەیبەستێ، بناغەی پەیمانی خوا کـە لە بەندەکانی وەردەگرێ، ئەوەیە کە جگە لە خوا هیچ شتێ بە پەرستراوی خۆیان نەزانن، وە بەندایەتیی بۆ کەسی دیکە نەکەن.

**بڕگـەی دووەم:** ﴿ وَبِٱلْوَٰلِدَيْنِ إِحْسَانًا ﴾: وەچاکە لەگـەڵ دایكو بابتانـدا بکـەن، لـە زۆر شـوێنی قورئانـدا خـوا ﷻ دوای بەندایـەتیکردن بۆخـۆیو پەرسـتنی خـۆی، یەکسەر باسی چاکـە لەگەڵ بـابو دایکـاندا دەکات.

**برگەی سێیەمو چوارەمو پێنجەم:** ﴿ وَذِى ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْيَتَـٰمَىٰ وَٱلْمَسَـٰكِينِ ﴾، واتە: وەچاكە بكەن لەگەڵ خزمانو لەگەڵ هەتیوانو لەگەڵ نەدارانو هاوكارییان بكەن، چاكەی ماددییو مەعنەویی، چونكە وشەی: ﴿ إِحْسَانًا ﴾ هەم لایەنی مەعنەویی دەگرێتەوە، كە ڕێزگرتنو دڵخۆشكردنو قسەی باش لەگەڵ كردنەو، هەم لە لایەنی ماددییش، كە بریتیە لە دەستگرۆییو هاوكارییو ئەوانە.

**برگەی شەشەم:** ﴿ وَقُولُوا۟ لِلنَّاسِ حُسْنًا ﴾: وە لەگەڵ خەڵكیدا بەگشتی چاكە بڵێن، جگە لە قسەی چاكو شێوازی چاك بەكارمەهێنن، بۆ قسەكردن لەگەڵ خەڵك.

**برگەی حەوتەمو هەشتەم:** ﴿ وَأَقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُوا۟ ٱلزَّكَوٰةَ ﴾: وە نوێژ بەرپا بكەنو زەكات بدەن، نوێژو زەكاتی خستۆتە دواوە، تاكو بزانین نوێژكردنێكو زەكات دانێك جێی خۆیان دەگرن، كە بەندایەتیی بۆ خوایان پێش كەوتبێ، هەروەها چاكەكردن لەگەڵ ئەوانەی كە لێتەوە نیزیكن، بەتایبەتی بابو دایك، ئنجا خزمان، وە ئەوانە كە شایستە (مستحق)ن، بەتایبەتی هەتیوو نەدارو هەژاران، وە قسەی چاك، دەبێ ئەوانەیان پێش كەوتبێ، ئنجا ئەو نوێژە نوێژەو ئەو زەكات دانە، جێگای خۆی دەگرێ، بەلام ئایا جوولەكەكان پابەند بوون؟! خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ ثُمَّ تَوَلَّيْتُمْ إِلَّا قَلِيلًا مِّنكُمْ وَأَنتُم مُّعْرِضُونَ ﴾، بەلام دوایی پشتتان هەڵكرد جگە لە كەمێكتانو لاملتان لەو پەیمانە كردو پێوەی پابەند نەبوون.

**برگەی نۆیەمو دەیەم:** ﴿ لَا تَسْفِكُونَ دِمَآءَكُمْ وَلَا تُخْرِجُونَ أَنفُسَكُم مِّن دِيَـٰرِكُمْ ﴾: وە (پەیمانمان لێتان وەرگرت) كە خوێنی خۆتان نەڕێژن {دیارە مەبەستی ئەوەیە كە خوێنی یەكتر نەڕێژن، بەلام چونكە خوێنی هەر خوشكو برایەكی مسوڵمان، هی ئەویدیكەیەو ئازار گەیشتن بەو، ئازار گەیشتنە بەخۆی،

بیـە وایفـەرمووە}، وە خۆتـان لـە مـاڵو حـاڵی خۆتـان وەدەرنـەنێن، تـۆ كـە خوشكو برای مسوڵمانی خۆتت وەدەرێ نـا، مانـای وایـە خـۆت وەدەرێنـاوەو كـە ئـازارت بـەو گەیانـد، مانـای وایـە بـەخۆتت گەیانـدوە، ﴿ ثُمَّ أَقْرَرْتُمْ وَأَنتُمْ تَشْهَدُونَ ﴾، دوایـی دانتـان پێـداهێنا وە ئێـوە شـایەدییتاندا ﴿ ثُمَّ أَنتُمْ هَٰؤُلَاءِ تَقْتُلُونَ أَنفُسَكُمْ وَتُخْرِجُونَ فَرِيقًا مِّنكُم مِّن دِيَارِهِمْ ﴾، كەچـی ئێـوە ئـەو كەسانە بـوون كـە خۆتانتـان دەكوشـت، واتـە: هەنـدێكتان هەنـدێكتان كوشـتو دەستتان چووە خوێنی یەكتـری، وەك لە هۆی هاتنە خوارەوەكەیدا باسمان كرد: تیـرە جوولەكـەكان هاوپـەیمان بـوون لەگـەڵ بـت پەرسـتەكانداو سـەرەنجام یەكتـریان دەكوشت بۆ بەرگرییكردن لـە هاوپەیمانـەكانیانو، برایـە دینیـەكانی خـۆیانیان دەكوشت لەسەر هاوپەیمانەكانیـان، ئنجا ئـەوە دەبوو بەهـۆی ئـەوەی كـە یـەكتریش دەربكـەن لـە مـاڵو حـاڵی خۆیـان ! ﴿ تَظَاهَرُونَ عَلَيْهِم بِالْإِثْمِ وَالْعُدْوَانِ ﴾، هاوكارییتـان لـە دژیـان دەكـرد، واتـە: هاوكـاریی دوژمنەكانتـان دەكرد لەسەر هاودینەكـانی خۆتان بـە گونـاهو بـە دەسـتدرێژیی ﴿ وَإِن يَأْتُوكُمْ أُسَارَىٰ تُفَادُوهُمْ ﴾، بـەڵام ئەگـەر هاتبانـە لاتـان بـە دیلـیی، دەتانكڕینـەوە فیدیـەو قەرەبووتـان بۆیـان دەدا﴿ وَهُوَ مُحَرَّمٌ عَلَيْكُمْ إِخْرَاجُهُمْ ﴾، لـە حاڵێكدا كە دەركردنیشیان هەر قەدەغە كرابوو لێتـان، كەچی دەركردنەكـەتان دەكـردو خوێنیانتـان دەڕشـتنو هاوكـاریی هاوپـەیمانی خۆتانتـان لـە دژیـان دەكـرد، واتـە: لـە چوار شـتان بـە شـتێكەوە پابەنـد دەبوون، ئـەویش ئـەوەبوو كاتێك بەدیـل دەگیـران، دەتانكڕینەوەو فیدیەتان بۆیان دەدا، بۆیـە دەفـەرموێ: ﴿ أَفَتُؤْمِنُونَ بِبَعْضِ الْكِتَابِ وَتَكْفُرُونَ بِبَعْضٍ ﴾، ئایـا بـڕوا بـە هەنـدێ لـە كـتێبی خوا دەكەنو كوفر بە هەنـدێكی دیكـەی دەكـەن؟! ﴿ فَمَا جَزَاءُ مَن يَفْعَلُ ذَٰلِكَ مِنكُمْ إِلَّا خِزْيٌ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا ۖ وَيَوْمَ الْقِيَامَةِ يُرَدُّونَ إِلَىٰ أَشَدِّ الْعَذَابِ ﴾، سـزای هەركەسێك لـە ئێـوە كـە ئـەوە دەكـات هـەر سەرشۆڕیی و زەبوونییـە لـە

ژیانی دنیادا، وە لە ڕۆژی دواییشدا دەگێڕدرێنەوە بۆ توندترین سزاو ئازار ﴿ وَمَا ٱللَّهُ بِغَٰفِلٍ عَمَّا تَعۡمَلُونَ ﴾، وە بێگومان خوا بێئاگانییە لەوەی کە دەیکەن، لە کۆتاییدا دەفەرموێ: ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ ٱشۡتَرَوُاْ ٱلۡحَيَوٰةَ ٱلدُّنۡيَا بِٱلۡأٓخِرَةِۖ فَلَا يُخَفَّفُ عَنۡهُمُ ٱلۡعَذَابُ وَلَا هُمۡ يُنصَرُونَ ﴾، ئا ئەوانە کەسانێکن کە ژیانی دنیایان بە دوارۆژ کڕیوە، سزاو ئازاریان لەسەرسووك ناکرێ و سەریش ناخرێن و، هیچ کەس نیە پشتیوانیان بێت، کەسێك خوا پشتیوانی نەبێت، دەبێ کێ پشتیوانی بێ ؟!

## چەند مەسەلەیەکی گرنگ

**مەسەلەی یەکەم:** پەیمان وەرگرتنی خوا لە بەندەکانی دوو جۆرە:

**یەکەم:** پەیمانی فیطرِیی.

**دووەم:** پەیمانی شەرعیی، هەڵوەشاندنەوەی هەر کام لەو پەیمانانەش گەورەترین گوناهە، خوا ﷻ لە قورئاندا باسی هەردووکیانی کردوەو، لە چەند شوێن لە قورئاندا بە مسوڵمانان دەفەرموێ: ﴿ وَإِذۡ أَخَذۡنَا مِيثَٰقَكُمۡ ﴾، یادبکەنەوە کاتێك کە پەیمانمان لێوەرگرتن! دیارە ئەوە مەرج نیە کە مەبەست تەنیا پەیمانی شەرعیبێ، بەڵکو زۆربەی جاران مەبەست پێی پەیمانی فیطرِییەو خوا ﷻ هەموو ئینسانێکی وا سروشتاندوەو خوڵقاندوە، کە خوای خۆی بناسێ و، بە فیطرەت تینووبێ بۆ بەندایەتیی خوا، وە تینووبێ بۆ دینداریی، ئا ئەوە بەڵێن و پەیمانێکەو، خوای پەروەردگار وەك بەڵێن و پەیمانێکی تەماشا کردوە، کە لە بەندەکانی وەریگرتوە، پەیمانی شەرعییش ئەوەیە کە لەسەر زمانی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام)، یاخود لەسەر زمانی جێگرانی پێغەمبەران و بەرپرسان، پەیمان لە کەسێك وەربگیرێت بۆ دینداریکردن، ئەوەش پەیمانی شەرعییە.

**مەسەلەی دووەم:** خوا ﷻ نەیفەرمووە: (لا تعبدوا إلا الله) بێجگە لە خوا مەپەرستن! بەڵکو فەرموویەتی: دەفەرموێ: ﴿لَا تَعْبُدُونَ إِلَّا اللَّهَ﴾، جگە لە خوا ناپەرستن، جا زانایانی ڕەوانبێژیی لێرەدا دەڵێن: خوا تبارك و تعالى بە شێوازی لابردن (نەفی) هێناویەتی نەك نەهێشتن (نەهی)، چونکە نەفی کاریگەرترە، واتە: ئێوە بنچینەو عادەت وایە، ئەگەر بتانەوێ ئیمانداربن، غەیری خوا ناپەرستن، عادەتو سیفەتتان وایە غەیری خوا ناپەرستن.

**مەسەلەی سێیەم:** ئەگەر تەماشا بکەین خوا ﷻ لەو پەیمانەدا دە (١٠) بڕگەییەدا، کە لە ئەسڵدا دوازدە (١٢) بڕگەیە وەك پێشتر باسمان کردوە، ڕیزبەندیی مەنتیقیی ڕەچاوکردوە: پێش هەموو شتێك خوا پەرستیی داناوە، ئنجا دوای ئەوە چاکە لەگەڵ دایك و باب، ئنجا چاکە لەگەڵ خزمان، ئنجا چاکە لەگەڵ هەتیو، کە بە تەئکید پاش خواپەرستیی، باب و دایك، لە هەموو کەس زیاتر هەقیان لەسەر تۆیە، وە لەدوای دایكو باب، خزم، وە لە دوای خزمان کە ئەو بازنەیە تەواو دەبێ، لە هەموو کەس شایستەتر بۆ چاکە لەگەڵداکردن منداڵی بێ بابە (هەتیو)، ئنجا دوایی خەڵکی هەژارو نەدارە، ئنجا دوایی قسەی باش لەگەڵ خەڵکدا کردنە، هەڵبەتە نوێژکردنو زەکاتدانیش هەردەچنە نێو خواپەرستیی یەوە، بەلام ئەو دوو بڕگەیە بە جیا هێنراون، بۆ زیادە گرنگیی پێدان، ئنجا دوایی دەست نەچوونە خوێنی خەڵك، وە دەست نەچوونە ماڵو سامانی خەڵكو، وە دەرنەنانیان لە ماڵو حاڵی خۆیان.

**مەسەلەی چوارەم:** ئەوەیە کە خوا بەگشتی فەرموویەتی: ﴿وَقُولُوا لِلنَّاسِ حُسْنًا﴾ و نەیفەرمووە: (وقولوا للمؤمنين حَسَناً) یان (لليهود حُسْناً) قسەی باش لەگەڵ ئیمانداراندا، لەگەڵ مسوڵماناندا بکەن، یان قسەی باش لەگەڵ جوولەکەکاندا بکەن، بەڵکو فەرموویەتی: ﴿وَقُولُوا لِلنَّاسِ حُسْنًا﴾، قسەی باش لەگەڵ خەڵکیدا بکەن، چونکە تۆ دینداریيەکەت دەبێ مامەڵەی پێ

لەگـەڵ هـەموو خەڵـکیدا بکـەی، نـەك تـەنیا لەگـەڵ هاودینەکانـدا بەڵـکو دینداریی‌و مسوڵمانەتیی‌و ئیمان، دەبێت تۆ ڕاست‌و دروست بکات لەگەڵ هەموو خەڵکداو، جوانت بکـات‌و چاکـت بکات‌و، لەگـەڵ هـەموو کەسـدا گـفت‌و لفتـت شـیرین بکـات‌و لەگـەڵ هـەموو کەسـدا ڕووت خۆشـبێ‌و، هەڵسوکەوتت بـەرزو جوان بێت، نـەك تـەنیا لەگەڵ خەڵـکی نێو بازنـەیەکی دیاریکـراودا، واتـە: بـە پێـچەوانەی ڕۆژئاواییەکـانەوە کـە وەختـێ بانگەشـەی مافـی مرۆڤـ و ئـازادیی بیـروڕا دەکەن، تەنیا بۆ خۆیانەو، کە دێنە دەرەوەی بازنـەی وڵاتەکـەی خۆیـان، دەبنە داگیـرکەرو ئاگـرو ئاسن لەگـەڵ خۆیـان دێنن، خوێن ڕێژیی دێنن، بـەڵاو موسیبەت دێـنن، بـەڵام دروشمـە جـوان‌و بریقـەدارەکان کـە بـەرزیان دەکەنـەوە، مەگـەر لـەنێو بازنـەی خۆیانـدا کـە ئـەویش بـە نیـوە چڵیـیەوەیە، ئەگـەرنا بـۆ دەرەوەی خۆیـان، پێـچەوانەی دروشمـەکانی خۆیانیـان پێیـە، بـەڵام مـسوڵمان وانیەو ئەهلی دین نابێ وابن، دەبێ ئـەو چاکییەی کە هەیانـە، لەگـەڵ هـەموو خەڵـك دابێ‌و لەگـەڵ هەموو مرۆڤایەتی دابێ.

**مەسـەلەی پێنجـەم:** کـە دەفـەرموێ: خـوێنی خۆتـان مەڕێـژن! ﴿لَا تَسۡفِكُونَ دِمَآءَكُمۡ﴾، وەك گوتم: لەبەرئەوەیە کە هەرکەسێ خوشك‌و برای دینی تۆیـە، تۆ دەبـێ خـوێنی ئـەو بـەهی خـۆت بزانـی‌و، خـوێنی خۆشـت بـەهی ئـەو بزانـی، وە خۆشیی ئەو بە خۆشیی خۆت‌و ناخۆشیی ئـەو بـە ناخۆشـیی خـۆت بزانـی، وەك پێغەمبـەر ﷺ لـە فەرموودەیەکـدا فەرموویـەتی: {(لَا يُؤْمِنُ أَحَدُكُم حَتَّى يُحِبَّ لأَخِيـهِ مَا يُحِبُّ لِنَفْسِـهِ) (رَوَاهُ الْبُخَارِيُّ برقـم: (١٣)، عَنْ أَنَس بْنِ مَالِكٍ رضي الله عنه}، واتە: یەکێك لە ئێوە ئیمانێ ناهێنـێ، تاکـو ئـەوەی بۆخـۆی پێـی خۆشـە، بـۆ برایەکەیـشی پێـی خـۆش نـەبێت، وە بـە پێـچەوانـەوەش: ئـەوەی بۆخۆت پێت ناخۆشە، دەبێ بۆ ویشت پێ ناخۆشـبێ، ئـەوجا دەبیـە ئیمانـداری کامڵ‌و چـاك.

**مەسەلەی شەشەم:** خوا پەروەردگار خوێنی بە ناهەق ڕشتن‌و، خەڵك لە ماڵ‌و حاڵی خۆ دەرکردنی، بەیەکەوە باسکردوە: ﴿لَا تَسْفِكُونَ دِمَآءَكُمْ وَلَا تُخْرِجُونَ أَنفُسَكُم مِّن دِيَـٰرِكُمْ﴾، وە لەڕاستیدا هەروایەو خەڵك دەرکردن لەسەر ماڵ‌و حاڵی، وەك کوشتنی وایە، بۆچی؟ چونکە زۆر کەس کە لەسەر ماڵ‌و حاڵی خۆی دەردەکرێ، تووشی ئاوارەیی‌و دەربەدەریی دەبێ، یان دەمرێ، یان تووشی قەرزداریی‌و تووشی نەخۆشیی‌و تووشی سەد بەڵاو گرفتاریی دەبێ، کە ئەویش لە حەقیقەتدا جۆرێکە لە مردنی مەعنەویی، وە وەك واقیع خەڵك کە لەسەرجێی خۆ هەڵدەقەنرێ، تووشی زۆر گرفت‌و کێشەو بەڵا دەبێ، کە ڕەنگە چی وا لەبەر مردن‌و مەرگدا نەبێت‌و بگرە مەرگیان لەبەر بە ئاوات بخوازێ!

**مەسەلەی حەوتەم:** کە باسی خوێن ڕێژیی‌و خەڵك دەرکردن لەسەر ماڵ‌و حاڵیان‌و هاوکارییکردنی دوژمنان، لە دژی برای دینی خۆیان دەکات، دەفەرموێ: ﴿بِٱلْإِثْمِ وَٱلْعُدْوَٰنِ﴾، بە گوناهو بە دەستدرێژیی، (إثم) ئەوەیە کە لە نێوانی خۆت‌و خوادا دەیکەی‌و خوا پێی ناخۆشە، (عُدوَان)یش ئەوەیە کە لەگەڵ خەڵکدا دەیکەی، وەك دەستدرێژیی‌و لە قورئاندا (إثم و عُدوَان) زۆر پێکەوە هاتون، وە پێچەوانەکەشیان (البِر) و (التَّقْوَى)ش بەیەکەوە هاتوون! کەواتە: پێویستە لەنێوانی خۆمان‌و خوادا خاوەنی: پارێزکاریی (تَقْوَى) بین‌و گوناح (إثم) دووربین، وە لە نێوان خۆمان‌و خەڵکدا خاوەنی: چاکەکاریی (بِرّ) بین‌و لە دەستدرێژیی (عُدوَان) دووربین.

**مەسەلەی هەشتەم:** کە دەفەرموێ: ﴿أَفَتُؤْمِنُونَ بِبَعْضِ ٱلْكِتَـٰبِ وَتَكْفُرُونَ بِبَعْضٍ﴾ ئایا بڕوا بە هەندێ لە کتێبی خوا دەکەن‌و کوفر بە هەندێکی دەکەن؟! بۆمان دەردەکەوێ کە کوفرکردن بە ئایەتێکی خوا، یان بە یاسایەکی کتێبی خوا، یان قەبووڵ نەکردنی هەندێکی، کوفرەو خوای دادگەر بە کوفری

لەقەڵەم داوە، ئنجا تەماشا بکەن جوولەکەکان چوار شتیان لێ داوا کرابوو:

**یەکەم**: یەکدی نەکوژن.

**دووەم**: یەکدی دەرنەکەن لەسەرماڵو حاڵی خۆیان.

**سێیەم**: هاوکاریی دوژمن نەکەن، لە دژی یەکدی.

**چوارەم**: ئەگەر یەکدییان بە دیلیی بینی، فیدیە بدەنو یەکدی بکڕنەوە.

جا جوولەکەکان لەو چوارە تەنیا بە یەکێکیانەوە پابەندبوونو بە سێیانەوە پابەند نەبوون! کەواتە: مسوڵمان کەسێکە کە بە هەموو کتێبی خواوەو تێکڕای بەرنامەی خواوە پابەندە، نەك گوڵبژێری بکاتو ئەوەی کە لەگەڵ ئارەزووو بەرژەوەندییدا دەگونجێ، پێوەی پابەندبێت! جوولەکەکان ئەوەندەی کە لەگەڵ بەرژەوەندییاندا دەگونجا، ئەوەبوو کە دیلەکان بکڕنەوەو ئازادیان بکەن، بەڵام ئەوانی دیکە نا، چونکە بەرژەوەندییان وابوو کە لەگەڵ هاوپەیمانەکانیان دابن دژی هاودینی خۆیانو، بیانکوژن لە ماڵو حاڵی خۆیان وەدەریان بنێن، هاوکارییان لەدژ بکەن، بەڵێ مسوڵمان نابێت سەرپشك بێو نابێ گوڵبژێر بکات لەنێو یاساکانی شەریعەتو بەرنامەی خواداو دەبێ بە هەموویەوە پابەند بێ.

**مەسەلەی نۆیەم:** خوا ﷻ دەفەرموێ: هەرکەسێك کوفر بە هەندێ لە کتێبی خوا بکاتو ئیمان بە هەندێکی بێنێ، لە دنیادا تووشی زەبوونییو سەرشۆڕیی دەبێ، جا بۆ زانیاریتان ئەوە تایبەت نیە تەنیا بە جوولەکەکانەوە، بەڵکو ئەوە یاسایەکی گشتی خوایەو، ئەگەر تەماشای واقیعی مسوڵمانان بکەین، دەبینین بە کردەوە زەبوونییو سەرشۆڕییمان بەسەرداهاتوە، کە لە سۆنگەی ئەوەوە کە بە شەریعەتی خواوەو بە ئاییینی خواوە پابەند نین، بە هەندێکیەوە پابەندینو بە زۆریەوە پابەند نین، ئەو سزایەی کە خوا باسی دەکات: ﴿ فَمَا جَزَآءُ مَن يَفۡعَلُ ذَٰلِكَ مِنكُمۡ إِلَّا خِزۡيٞ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا ﴾، ئەو زەبوونییو بێدەسەڵاتییە ئەوەتا تووشی ئێمەش بووە،

وەك چۆن کاتی خۆی تووشی جوولەکەکان بوو بوو ! کەواتە: ئەوە یاساو سوننەتێکی خوایەو گشتگیرە بۆ هەموو مرۆڤایەتی، نەك تەنیا تایبەت بێ بە جوولەکەکانەوە، ئنجا دیارە سزای قیامەتیش هەر هەیەو لە دوارۆژدا دەگێڕدرێنەوە بۆ توندترین سزا، خوا پەنامان بدات !

**مەسەلەی دەیەم:** لێرەدا خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ ٱشۡتَرَوُاْ ٱلۡحَيَوٰةَ بِٱلۡأٓخِرَةِ ﴾، ئەوانە کەسانێکن ژیانی دنیایان کڕیوە بە دوارۆژ، واتە: ژیانی ڕۆژی دوایی یان کردوە بە کاڵایەك و داویانەو، لە بەرانبەردا بەرژەوەندییان وەرگرتوە، ژیانی دوارۆژیان وەك نرخێك داوەو بەرژەوەندیی ژیانی دنیایان وەدەست هێناوە، وە هەمیشە کە خەڵك لە دینی خوا لادەدا، لە شەریعەتی خوا لادەدا، بە هۆی ئەوەوەیە کە بەرژەوەندیی دنیا هەڵدەبژێرێ، بەسەر ڕازیکردنی خواو بەسەر بەرنامەو شەریعەتی خوادا.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی حەڤدەیەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان کە لە ئایەتی (٨٧ تاکو ٩١) دەگرێتە خۆی، واتە: پێنج (٥) ئایەت لە سوورەتی (البقرة)، نێوەڕۆکی ئەم ئایەتانە بریتیە لە خستنەڕووی چەند هەڵوێستێکی خراپی جوولەکەکان، وەك بەدرۆ زانینی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام)، وە کوشتنی هەندێکیان، وە کوفر بە کتێبی خوا، پاش ئەوەی زانیویانە کە خوا ناردوویەتی، (کە مەبەست پێی قورئانە)، وە دوای ئەوەی کە پێغەمبەری کۆتاییان ناسیوە، بە سیفەتەکانی کە لە تەوراتدا هاتوون، وە لاف لێدانیان بەوە کە ئیمانیان بە کتێبی خوا هەیە، ئەو کتێبە کە لەلای خۆیانە، لە حاڵێکدا کە کوفریان کردوە بەو کتێبەی، کە خوا لە کۆتاییدا ناردوویەتی و ئەو کتێبە لای ئەوانیش وەك ئەسڵەکەی بەڕاست دەزانێ.

﴿ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْكِتَـٰبَ وَقَفَّيْنَا مِنۢ بَعْدِهِۦ بِٱلرُّسُلِ ۖ وَءَاتَيْنَا عِيسَى ٱبْنَ مَرْيَمَ ٱلْبَيِّنَـٰتِ وَأَيَّدْنَـٰهُ بِرُوحِ ٱلْقُدُسِ ۗ أَفَكُلَّمَا جَآءَكُمْ رَسُولٌۢ بِمَا لَا تَهْوَىٰٓ أَنفُسُكُمُ ٱسْتَكْبَرْتُمْ فَفَرِيقًا كَذَّبْتُمْ وَفَرِيقًا تَقْتُلُونَ ﴿٨٧﴾ وَقَالُوا۟ قُلُوبُنَا غُلْفٌۢ ۚ بَل لَّعَنَهُمُ ٱللَّهُ بِكُفْرِهِمْ فَقَلِيلًا مَّا يُؤْمِنُونَ ﴿٨٨﴾ وَلَمَّا جَآءَهُمْ كِتَـٰبٌ مِّنْ عِندِ ٱللَّهِ مُصَدِّقٌ لِّمَا مَعَهُمْ وَكَانُوا۟ مِن قَبْلُ يَسْتَفْتِحُونَ عَلَى ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ فَلَمَّا جَآءَهُم مَّا عَرَفُوا۟ كَفَرُوا۟ بِهِۦ ۚ فَلَعْنَةُ ٱللَّهِ عَلَى ٱلْكَـٰفِرِينَ ﴿٨٩﴾ بِئْسَمَا ٱشْتَرَوْا۟ بِهِۦٓ أَنفُسَهُمْ أَن يَكْفُرُوا۟ بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ بَغْيًا أَن يُنَزِّلَ ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦ عَلَىٰ مَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦ ۖ فَبَآءُو بِغَضَبٍ عَلَىٰ غَضَبٍ ۚ وَلِلْكَـٰفِرِينَ

عَذَابٌ مُّهِينٌ ﴿٩٠﴾ وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ ءَامِنُواْ بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ قَالُواْ نُؤْمِنُ بِمَآ أُنزِلَ عَلَيْنَا وَيَكْفُرُونَ بِمَا وَرَآءَهُۥ وَهُوَ ٱلْحَقُّ مُصَدِّقًا لِّمَا مَعَهُمْ ۗ قُلْ فَلِمَ تَقْتُلُونَ أَنۢبِيَآءَ ٱللَّهِ مِن قَبْلُ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿٩١﴾ ﴾.

## مانای وشە بە وشەی ئایەتەکان

((وە بێگومان ئێمە کتێبمان بە مووساداو بەدوای ویدا پێغەمبەرانی دیکەمان ناردن، وە بەڵگە ڕۆشنەکانمان بە عیسای کوڕی مەریەم دانو بە گیانی پاکیش پشتگیرییمان کرد، جا ئایا (ئەی جوولەکەکان شتێکی زۆر ناهەقتان نەکرد؟) کە هەرکات پێغەمبەرێك شتێکی بۆ هێنان کە نەفستان ئارەزووی نەکرد، کۆمەڵێکیانتان بە درۆزنزانیو کۆمەڵێکیانتان کوشتن؟ ﴿٨٧﴾ وە (جوولەکەکان) گوتیان: دڵمان هەگبەیە (بۆ زانیاری) بەڵام وانیە، بەڵکو بەهۆی بێ بڕواییانەوە خوا نەفرینی لێکردوون، وە بە کەمیی بڕوا دێنن ﴿٨٨﴾ وە کاتێك کتێبێکیان لەلایەن خواوە بۆ هات کە ئەوەی بەوانیشە بەڕاستی دەزانێ، وە پێشتریش چاوەڕوانییان دەکردو داوای سەرکەوتنیان دەکرد بەسەر ئەوانەدا کە بێبڕوان، کەچی کاتێك ئەو پێغەمبەرەیان بۆ هات کە دەیانناسی، بڕوایان پێ نەکرد، دەجا نەفرەتی خوا لە بێبڕوایان بێ ﴿٨٩﴾ خراپترین نرخیش کە خۆیانیان پێ فرۆشت، ئەوەبوو کە بڕوا نەهێنن بەوەی، کە خوا ناردوویەتە خوار، ئەویش لە سۆنگەی حەسودییان بەوە، کە خوا لە بەخششی خۆی (کتێب) بنێرێتە سەر هەرکام لە بەندەکانی کە بیەوێ، ئیدی سەرەنجام بە تووڕەیی لەسەر تووڕەیی گەڕانەوە، وە بێبڕوایان ئازارێکی ڕیسواکەریان هەیە ﴿٩٠﴾ وە ئەگەر پێیان بگوترێ: ئیمان بەوە بێنن کە خوا ناردوویەتە خوار، دەڵێن: تەنیا بڕوا بەوە دێنین، کە بۆ سەرخۆمان هاتۆتە خوارێ، وە بە هەموو ئەوەی دیکە بێبڕوان، لەحاڵێکدا کە حەقە، وە ئەوەی بەوانیشە بەڕاستی دەزانێ! بڵێ: ئەدی ئەگەر ڕاستە بڕوادارن، بۆچی پێشتر پێغەمبەرانی خواتان دەکوشت؟! ﴿٩١﴾)).

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(وَقَفَّيْنَا): لە (قَفَا)وە هاتوە، یانی: پشتەمل، عارەب دەڵێن: (وقَفَّيْتُهُ أي جَعَلْتُهُ خَلْفَهُ وأتْبَعتُهُ) واتە: شتێکم بەدوای شتێك خستو لە دوایەوە بەڕێم کرد. (الإقتِفاء: إتِّبَاعُ القَفا)، واتە: شوێن پێ هەڵگرتن.

(وَأَيَّدْنَٰهُ): لە (أَيّد)ەوە هاتوە، (الأيّد: القُوَةُ الشَّدِيدَة)، (أيَّدناهُ: يَعني قَوَّيناهُ) بەهێزمان کرد، پشتگیریمان کرد.

(بِرُوحِ ٱلْقُدُسِ): (رُوح) واتە: گیان، (قُدُس) واتە: پاك، کە لێرەدا مەبەست پێی جوبرائیله ﷺ کە خوای پەروەردگار لە قورئاندا بە (الروح الأمين)یش ناوی هێناوەو، بە (رُوح القُدُس)یش ناوی هێناوە، وەك دەفەرموێ: ﴿ قُلْ نَزَّلَهُۥ رُوحُ ٱلْقُدُسِ مِن رَّبِّكَ بِٱلْحَقِّ ...﴿١٠٢﴾ ﴾ النحل، واتە: بڵێ (رُوح القُدُس) لە پەروەردگارتەوە ئەم قورئانەی دابەزاندوە، بە هەق ...

(لَا تَهْوَىٰٓ): واتە: ئارەزووی لێ نەبێ (الهَوَى: مَيْلُ النَّفْسِ إلى الشَّهْوَةِ)، (هَوَى) بریتیە لەوە کە نەفس ئارەزووی شتێك بکات کە مەیلی لێیە، ئنجا بۆچی ئارەزوو ناونراوە (هَوَى)؟ دەڵێ: (لأنَّهُ يَهْوَي بِصَاحِبِهِ في الدُّنيَا إلى كُلِّ داهِيَةٍ، وفي الآخِرَةِ إلى الهَاوِيَةِ)، واتە: لەبەرئەوەی ئارەزوو لە دنیادا ئینسان بەرەو هەر بەڵایەك پەلکێش دەکات، وە لە دوارۆژیشدا تووشی دۆزەخی دەکات.

(غُلْفٌۢ): (قيلَ هو جَمْعُ أغْلَف مِثل: سَيْفٌ أغْلَفُ)، واتە: (غُلْفٌ) کۆی (أَغْلَفَ) یانی: شتێك کە لە کیف دابێ، یاخود لە توورەکەدابێ، وەك شمشێر کە لە کالان دابێ، دەشگونجێ کە (غُلْفٌ) کۆی (غِلاف) بێ، واتە: پەردە، کە ئەوە دوو واتای هەن، وەك دوایی باسی دەکەین، واتە دڵمان لەنێو توورەکە دایەو قسەی تۆی ناگاتێ، پەردەی بە سەرەوەیەو قسەی تۆی ناگاتێ، یاخود دڵمان

تووڕەکەی عیلم‌و زانستەو پێویستیمان بەو زانستەی تۆ نیە، کە من بەوەی دووەمیان تەفسیرم کردوە.

(لَّعَنَهُمُ ٱللَّهُ)، واتە: خوا نەفرینی لێکردوون، (اللَّعْنُ: الطَّرْدُ والإبْعَادُ عَلَى سَبِيلِ السَّخَطِ وذَلِكَ مِنَ اللهِ تعالى في الآخِرَةِ عُقُوبَةٌ وفي الدُّنيا انْقِطَاعٌ مِنْ قَبُولِ رَحْمَتِهِ وتَوفِيقِهِ)، واتە: (لعْن) دەرکردن‌و دوورخستنەوەیە، بەشێوەی لێتووڕەبوون، کە ئەوەش لە دواڕۆژدا سزادانە لەلایەن خوای بەرزەوە، وە لە دنیادا دابڕانە لە وەرگرتنی بەزەیی‌و هاوکاریی خوا.

(يَسْتَفْتِحُونَ)، (الإسْتِفتَاحُ، طَلَبُ الفَتْحِ أو الفِتَاحِ، يَستفتِحونَ: يَسْتَنْصِرُونَ اللهَ بِبَعْثَةِ محمد) واتە: (إسْتِفتَاح) داواکردنی یارمەتیی‌و داواکردنی سەرخستنە، مەبەست ئەوەیە کە جوولەکەکان بەهۆی ڕەوانەکرانی موحەممەد، داوایان دەکرد، خوا سەریان بخات.

(ٱشْتَرَوْاْ بِهِۦٓ)، واتە: پێیان دەکڕی (الأشتِرَاء: كُلُّ مَا يحصل بِهِ شَيء) واتە: دواڕۆژیان دەکردە نرخێك وە دنیایان دەکردە کالایەك دنیایان لە بەرانبەردا وەدەست دەهێنا، وە دواڕۆژیان لەدەست دەدا.

(بَغْيًا)، (البَغي: طَلَب تجَاوز الإقتِصَاد فِيمَا يُتحَرَّى) واتە: ئەسڵی وشەی (البَغي) واتە: سنوور شکاندن‌و لە سنووری میانجیی دەرچوون لە شتێکدا کە خەفتانی بۆ دەکرێ، کە لە هەندێ شوێن بەمانای (حَسَد) یان لێکداوەتەوە، چونکە حەسوودییش بریتیە لە سنوور شکاندن و لە خەت دەرچوون.

(فَضْلِهِۦ)، (فَضْلٌ) (الزِيَادَةُ عَنِ الإقتِصَاد) زیادە لە ڕاددەی میانجیی، یان هەر جۆرە زیادەك، وە ئاواش پێناسەکراوە: (وكُلُّ عَطِيَّةٍ لاَ تَلْزَمُ مَنْ يُعْطِي) هەر بەخششێکە کە پێویست نەبێت بەخشەر بیبەخشێ، واتە: ئەوە کە کەسێك شتێکت بداتێ، کە پێویست نەبێ لەسەری بتداتێ.

(**فَبَآءُو**): (أصْلُ البَوَاء: مُسَاوَاة الأجزَاء في المكَان، خِلاف النُّبُوّ الّذي هو مُنَافاة الأجزَاء)، واته: (بَوَاء) له بنەڕەتدا به یەكسانیی‌و تەختبوونی بەشەكانی شوێنێك دەگوترێ، پێچەوانەكەی (نُبو)ە كه بەرزیی‌و نزمیی‌و نایەكسانیی بەشەكانی شوێنێكە، وشەی (بآء)، واته: (رَجَعَ) گەڕایەوە، وه (بآء)، واته: شوێنی دیاریكرد، وەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: {(مَنْ كَذَبَ عَلَيَّ مُتَعَمِّداً فَلْيَتَبَوَّأْ مَقْعَدَهُ مِنَ النَّارِ) (رَوَاهُ البُخَارِيُّ برقم: (١١٠)، وَمُسْلِم برقم: (٤)، وَالتِّرمِذِيّ برقم: (٢٦٥٩)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٣٠)، وَالدَّارَمِي برقم: (٢٣٥)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٣١)}، واته: هەر كەسێك بەئەنقەست درۆ به زمانی منەوە بكات، با شوێنی خۆی له دۆزەخدا دابنێ، كەواته: (بآء)، واته: گەڕانەوە بۆ ئەو شوێنەی كه بۆی دەگەڕێتەوەو تێدا نیشتەجێبوونی.

(**مُّهِينٌ**): (مُهِين)یش له (هَان)ەوە هاتوە: (هَانَ يَهُون: سَهُلَ، والهَوَان: التَّذَلُّل) واته: (هَانَ) سووك بوو، (یهون) سووك دەبێ، یاخود بەمانای ئاسان بوو، ئاسان دەبێ، وه (هَوَان) بریتیه له زەلیلیی‌و زەبوونیی.

## هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتەكان

هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ڕستە قورئانییە، كه دەفەرموێ: ﴿... وَكَانُواْ مِن قَبْلُ يَسْتَفْتِحُونَ عَلَى ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فَلَمَّا جَآءَهُم مَّا عَرَفُواْ كَفَرُواْ بِهِۦۚ فَلَعْنَةُ ٱللَّهِ عَلَى ٱلْكَٰفِرِينَ ﴾، {(أَخْرَجَ ابْنُ إِسْحَاق، وَابْنُ جَرِير، وَابْنُ الْمُنذِر، وَأَبُو نعيم، وَالبَيْهَقِيُّ عَن طَرِيق عَاصم بْنِ عمر بْنِ قَتَادَة الأَنْصَارِيّ قَالَ: حَدَّثنِي أَشياخٌ مِنَّا قَالُوا: لَمْ يَكن أحَدٌ مِن العَرَب أعلَم بشأن رَسُول الله ﷺ مِنَّا، لأن مَعَنَا اليَهود وكَانوا أهلَ الكِتَابِ وكُنَّا أصحَاب وَثَنٍ وكَانوا إذا بَلَغَهُم مِنَّا مَا يَكرَهُون، قَالُوا: إنَّ نَبِياً يُبعَثُ الآن قد أظَلَّ زَمَانُه نَتَّبِعهُ فَنَقْتُلُكُمْ مَعَهُ قتل عَادٍ و إرَم، فَلَمَّا بُعِثَ رَسُولُ اللهِ ﷺ اتبعنَاهُ وكَفَروا بِهِ، فَفِينا والله وفِيهِم أنزَلَ الله

﴿وَكَانُواْ مِن قَبْلُ يَسْتَفْتِحُونَ عَلَى ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ...﴾) (فتح القدير، ج: (١)، ص: (١٥٦)}، واتە: ئەو هاوەڵە کە بە پشت دەچێتەوە سەر ئەنصارییەکان، دەڵێ: بەتەمەنەکانمان دەیانگوت: هیچ کەسێك لە ئێمە شارەزاتر نەبوو بە کاروباری پێغەمبەر ﷺ، پێش ئەوەی بێتە مەدینەو پێش ئەوەی خوا ڕەوانی بکا)، دەڵێ: چونکە جوولەکەکانمان لەنێودا دەژیان‌و ئەوانیش خاوەنی کتێب بوون، وە ئێمە بتپەرست بووین، جا کاتێ شتێکیان لە ئێمە دەبینی کە پێیان ناخۆش دەبوو، هەڕەشەیان لێ دەکردین‌و دەیانگوت پێغەمبەرێك دێت، ئێستا ڕۆژگارەکەی نزیك بۆتەوە، هەر کاتێك هات ئێمە شوێنی دەکەوین‌و وەك چۆن عادو ئیرەم لەبەین چوون کاتی خۆی، ئاوا لە بەینتان دەبەین‌و لەگەڵیدا دەتانکوژین، بەڵام کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ ڕەوانەکرا (ئەنصارییەکە دەڵێ): ئێمە ئیمانمان پێهێنا (واتە: خەڵکی مەدینە: ئەوس‌و خەزرەج)، بەڵام جوولەکەکان کوفریان پێکرد، جا سوێند بەخوا لەبارەی ئێمەو ئەوانەوە، خوا ئەم ئایەتەی نارده خوارێ.

هەروەها هەر لەوبارەوە ئەو گێڕانەوەیەش هەیە: {كَانَت العَرَب تمرُّ باليَّهُود فَيؤذونهم، وكَانوا يَجدون مُحمداً في التوراة فيَسألُونَ الله أَنْ يَبْعَثَ نبيَاً فيُقَاتِلونَ مَعَهُ العَرَب، فَلَمَّا جَاءَ مُحَمدٌ ﷺ كَفَروا بِهِ حَسَداً، وَقَالُوا: إنَّمَا كَانَت الرُّسُلُ مِنْ بَني إسرَائيل، فمَا بَالُ هَذا مِن بني إسماعيل؟} (فتح القدير، ج (١)، ص: (١٥٧)، وأسباب النزول للنيسابوري، ص: (١٧)، وَالبَيْهَقي في (الدلائل) عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ وَابْنُ مَسْعُودٍ وَعَنِ جَمَاعَةً مِنَ الصَحَابَة)، واتە: عەرەبەکان کاتێ ئازاری جوولەکەکانیان دەدا لەکاتی بەلادا تێپەڕبوونیاندا، ئەوانیش ناوو سیفەتی موحەممەدیان ﷺ لە تەوراتدا دەبینی‌و داوایان لە خوا دەکردو دەیانگوت: خوایە ئەو پێغەمبەری کۆتایی یە بێ، بۆ ئەوەی لە خزمەتیدا شەڕ بکەین دژی ئەو عەرەبە بتپەرستانە، بەڵام کاتێ کە موحەممەد ﷺ هات، کوفریان پێکرد، بەهۆی حەسودیی یەوە، وە گوتیان: پێغەمبەران هەر لە وەچەی ئیسرائیل بوون، بۆچی ئەم لە نەوەی ئیسماعیل ڕەوانەکراوە.

## مانـــای گـــشـــتی ئـایـەتەكـــان

خـوا ﷻ چـەند هەڵوێـستێكی دیكـەی خراپـی بـابو باپیـرانی جوولەكـەكانی ڕۆژگاری پێغەمبـەری خـوا (محمـد) ﷺ دەخاتـەوە بیـریانو، دەفـەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْكِتَٰبَ وَقَفَّيْنَا مِنۢ بَعْدِهِۦ بِٱلرُّسُلِ ﴾، واتـە: ئێمـە كتێبمـان بـە مووسادا وە دوای ئەویش پێغەمبەرانمان ڕەوانكـردن، ﴿ وَءَاتَيْنَا عِيسَى ٱبْنَ مَرْيَمَ ٱلْبَيِّنَٰتِ وَأَيَّدْنَٰهُ بِرُوحِ ٱلْقُدُسِ ﴾، وە بەڵـگە ڕۆشنەكانمان بە عیسای كوڕی مەریـەم دان، مـوعجیزەی زۆر ئاشـكراو سەرسـوڕهێنەرمان پێـدان، بـە (روح القـدس)یـش، كـە جوبرائیلـە بـەهێزمان كـردو پـشتمان گـرت، جوبرائیـل لەگـەڵی بـوو یارمـەتی دەدا، ئنجـا ڕوو دەكاتـــەوە جوولەكـــەكانو، دەفـــەرموێ: ﴿ أَفَكُلَّمَا جَآءَكُمْ رَسُولٌۢ بِمَا لَا تَهْوَىٰٓ أَنفُسُكُمُ ٱسْتَكْبَرْتُمْ ﴾ ئایا هەر كاتێك پێغەمبەرێك هات، شتێكی هێنا كە نەفستان ئارەزووی نەكردو لەگەڵ ئارەزووی ئێوەدا نەدەگونجا، خۆتان لێ بە زلگرت لە بەرانبەریدا ؟! ﴿ فَفَرِيقًا كَذَّبْتُمْ وَفَرِيقًا تَقْتُلُونَ ﴾، جـا هەنـدێكتان لـێ بـە درۆزن زانـینو هەندێكیـشتان لـێ كوشـتن !، واتـە: هەربەوەنـدە تاوانـە وازتـان نـەهێنا، كـە بەدرۆزنتان دەزانین، بەڵكو كوشتنیشیتان، واتە: ئایا شتێكی زۆر بێجێتـان نـەكرد، ئـەی جوولەكـەكان كـە ئـەوە هەڵوێـستتان بـوو لـە بەرانبـەر پێغەمبـەرانی خـوادا (علیهم الصلاة والسلام) ؟! كە لە نێوانیاندا عیسای كوڕی مەریەمـە، ئـەو هـەموو بەڵـگە ڕوونو ئاشـكرایانەی هێنـان، كەچـی ئێـوە نـەك هـەر بـڕواو باوەڕتـان پێـی نـەكرد، بەڵـكو پیلانتـان لێگـێڕا كـە لەسـێدارە بـدرێو بكـوژرێ، بـەڵام خـوای كاربەجێ بەرزی كردەوە، دواییش بوختانتان بۆ كرد گوتتان زۆڵە[1]، لە حاڵێكـدا كـە خـوا ﷻ بەشـێوەیەكی تایبـەت عیـسای خوڵقانـدبوو، جـوبرائیلی نـاردبوو ڕووحەكەی خستبووە بەرجەستەی دایكی، بەڵـێ بـابی نـەبوو، بـەڵام زۆڵ نـەبوو،

---

١) زۆڵ: بیـژوو، بیـژی ، كەسێك دایكی زینای كردبێو كوڕشی بابی خۆی نەبێ.

وەك جوولەکەکان دەیانگوت، بەڵکو هەر لە دایکبوونەکەشی بۆخۆی موعجیزە بوو، ئنجا باسی هەڵوێستێکی دیکەیان دەکاو دەفەرموێ: ﴿ وَقَالُواْ قُلُوبُنَا غُلْفٌ ﴾، وە گوتیان: دڵمان هەگبەو توورەکەی زانیارییە، واتە: دڵمان پڕبووە لە عیلمو زانست (معرفة)و پێویستییمان بەهی تۆ نیە، ئەی موحەممەد !، ئەوە مانایەکیەتی کە من ئەم مانایەم پێ بەهێزترە، وە دەشگونجێ (غُلُف) کۆی (غِلاف) بێ، واتە: دڵمان پەردەی بەسەردا دراوە، یاخود دڵمان لە توورەکەیەکدا پێچراوەو هیچ هیدایەتی تۆی ناگاتێ[1]! خوای تاکیش دەفەرموێ: ﴿بَل لَّعَنَهُمُ ٱللَّهُ بِكُفْرِهِمْ فَقَلِيلًا مَّا يُؤْمِنُونَ ﴾، بەڵکو خوا دووری خستوونەوە لە ڕەحمەتی خۆی بەهۆی هەڵوێستە کافرانەکەیانەوەو هیدایەتیان نادات، بۆیە بەکەمیی ئیمان دێنن، کەمێکیان نەبێت ئیمان ناهێنن، یاخود ئیمانێکی کەم ئیمان دێنن، کە ئەویش هی ئەوانەیانە کە تاکوتەران، ئنجا باسی هەڵوێستێکی دیکەیان دەکاتو دەفەرموێ: ﴿ وَلَمَّا جَآءَهُمْ كِتَٰبٌ مِّنْ عِندِ ٱللَّهِ مُصَدِّقٌ لِّمَا مَعَهُمْ ﴾، وە کاتێك کتێبێکیان لەلایەن خواوە بۆ هات، کە ئەوەی لەگەڵ ئەوانیشەو بەوانیشە (کە تەوڕاتە) بەڕاستی دەزانێ، واتە: ئەسڵەکەی بەڕاست دەزانێ، مانای وایە ئەو کتێبە کە هاتوە، دژی کتێبەکەی ئەوان نیە، بەڵکو بەڕاستی دەزانێو پشتگیریی دەکات، ﴿ وَكَانُواْ مِن قَبْلُ يَسْتَفْتِحُونَ عَلَى ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ﴾، وە پێشتریش ئەوان داوای یارمەتییان لە خوا دەکرد کە زاڵیان بکات بەسەر کافرەکان دا، (دەیانگوت: خوایە ئەو پێغەمبەرەی کۆتایی بازووبێ تاکو ئیمانی پێ بهێنین، وە لەگەڵی دابین بۆ ئەوەی بەسەر کافرەکاندا زاڵبین، کە زوڵممان لێدەکەن) ﴿ فَلَمَّا جَآءَهُم مَّا عَرَفُواْ كَفَرُواْ بِهِۦ ﴾، بەڵام کاتێك ئەو کەسە هات بۆلایان، کە دەیانناسی (کە موحەممەدە)، پێی بێبڕوا بوونو بڕوایان پێنەکرد، هەرچەندە چاك چاکیشیان دەناسی، وەك لە شوێنی دیکەدا دەفەرموێ: ﴿ ٱلَّذِينَ ءَاتَيْنَٰهُمُ ٱلْكِتَٰبَ يَعْرِفُونَهُۥ كَمَا يَعْرِفُونَ أَبْنَآءَهُمْ ...﴿١٤٦﴾ ﴾

---

١) کە بە پێی ئەم مانایە بێ، مەبەستیان گاڵتە پێکردن (إستهزاء) بووە.

البقـرة، واتـە: ئەوانـەی کتێبمـان پێـداون موحەممـەد دەناسـن، وەك چۆن کوڕەکـانی خۆیان دەناسن. ﴿ فَلَعۡنَةُ ٱللَّهِ عَلَى ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴾، دەجا نەفرینی خـوا لـە کافران بـێ، واتـە: زیـاتر دوور بکەونـەوە لـە بـەزەیی و ڕەحمـەتی خـوا، ﴿ بِئۡسَمَا ٱشۡتَرَوۡاْ بِهِۦٓ أَنفُسَهُمۡ ﴾، خراپتـرین شتێك کە نەفسی خۆیانیان پێ فرۆشت: ﴿ أَن يَكۡفُرُواْ بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ ﴾، ئـەوەبوو کـە کـوفر بکـەن بـە کـتێبێك، کـە خـوا ناردوویەتـە خوارەوە، خراپتـرین نرخێك کە خۆیانیان پێ فرۆشت، بریتی بوو لە چی؟ بـریتی بوو لە کوفر، ئنجا بۆچی کافربوون ؟! ﴿ بَغۡيًا أَن يُنَزِّلَ ٱللَّهُ مِن فَضۡلِهِۦ عَلَىٰ مَن يَشَآءُ مِنۡ عِبَادِهِۦ ﴾، هاندەریان کوفر کردنیان بە کـتێبی خـوا، ئـەوەبوو کـە حەسوودییان برد بەوە کە خوا لە بەخششی خۆی بنێرێتـە سـەر هـەر کامێـك لـە بەندەکـانی، (کـە مەبەسـت موحەممـەدە ﷺ حەسـوودییان پـێ بـرد، دیـارە جوولەکـەکان چاوەڕێیان دەکرد پێغەمبەری کۆتایی لەنێو خۆیان بێ، لە بەنی ئیسرائیل بـێ، جـا کاتێـك لـەنێو عەرەبەکانـدا هـات، حەسـوودییان پـێ بـردو گوتیـان: ئیمـانی پـێ نـاهێنین ﴿ فَبَآءُو بِغَضَبٍ عَلَىٰ غَضَبٍ ﴾، ئیـدی سەرەنجـام تـووڕەیی لەسـەر تووڕەییـان هاتە سەر، یاخود تووڕەیی لەسەر تورەییان وەدەسـت هێنـا، وەك چۆن کەسێك دەچێت بۆ سەفەرێك و کۆڵێکی لە کۆڵـێ نـاوە، واتـە: کـە گەڕانـەوە بـۆ لای خـوا، بە تـووڕەیی خـواوە دەگەڕێنـەوە، پێشـێ خـوا لێیـان تـووڕە بـوو بـەهۆی ئـەو هەموو سەرپێچییانەی کـە کردیـانن، وە دوایـی ئەوەشیان هێنایەسەرو سەربارەش کوفریان کـرد بـە پێغەمبـەری کۆتـایی ﷺ، ﴿ وَلِلۡكَٰفِرِينَ عَذَابٞ مُّهِينٞ ﴾، وە بـۆ بێبـڕوایان ئـازارێکی ڕیسـواکەر هەیـە، ئنجا لـە کۆتاییـدا هەڵوێـستێکی دیکەیـان بـاس دەکـات و، دەفـەرموێ: ﴿ وَإِذَا قِيلَ لَهُمۡ ءَامِنُواْ بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ قَالُواْ نُؤۡمِنُ بِمَآ أُنزِلَ عَلَيۡنَا ﴾، وە ئەگەر پێیان بگوترێ: ئیمـان بـەوە بێـنن کـە خـوا ناردوویەتـە خـوار (کە قورئانە) دەڵێـن: ئێمە بەس ئیمان دێنـین بەوەی کە بۆ سەر خۆمان دابەزیوە، جـا باشـە خـوا ﷻ کـتێبێکی بـۆ سـەر ئێـوە نـاردوە ئیمانتـان پێهێنـاوە، ئـەوە زۆر

باشە، بەڵام مادام هەر خوا كتێب بۆ سەر عیسا ﷺ بنێرێ، دەبێ ئیمان بەویش بێنن، كە ئیمانیان بەویش نەهێناوە، وە ئەگەر كتێب بۆ سەر (موحەممەد)یش ﷺ بنێرێ، وە بۆ سەر هەركام لە پێغەمبەرانی دیكە بنێرێ، تۆ مادام بەڕاستی خوا بە پەروەردگاری خۆت بزانی، هەر كتێبێك بنێرێ، دەبێت ئیمانی پێ بێنی، نەك دەمارگیر (متَعَصّب)بیو تەنیا بەو كتێبە ئیمان بێنی كە بۆ سەرخۆت ڕەوانەكراوە، مادام هەمووی لە خواوەیە، دەبێ ڕێزت بۆ هەمووی هەبێ، ئنجا دەفەرموێ: ﴿ وَيَكْفُرُونَ بِمَا وَرَآءَهُۥ وَهُوَ ٱلْحَقُّ مُصَدِّقًا لِّمَا مَعَهُمْ ﴾، هەرچەندە ئیددیعای ئیمان دەكەن بەوەی كە بۆ سەرخۆیان هاتوە، مادام كوفر دەكەن بەوەی دیكە كە لە پاش وی هاتوە لە حاڵێكدا كە هەقیشەو ئەوەی بەوانیشە بەڕاستی دەزانێ، مانای وایە ئیمانیان بە كتێبەكەی خۆشیان هەڵدەوەشێتەوە، بۆچی؟ چونكە هەر كتێبەكەی خۆیان دەڵێ: دەبێ ئیمان بێنن بە هەموو كتێبەكانی خوا، وە ئیمان بێنن بەو كتێبەی كە بۆ پێغەمبەری كۆتایی دێت ﷺ، ئنجا لە كۆتاییدا خوای پەنهانزان خاڵێكی ڕەشی مێژووی خۆیانیان دەخاتە بەرچاویان، كە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ئیمانەكەیان هەر لە دوای مووساوە كە تووشی لادانو غەڵەت بوون، ئیمانێكی ڕاستو تەواو نیە، چونكە دەفەرموێ: ﴿ قُلْ فَلِمَ تَقْتُلُونَ أَنۢبِيَآءَ ٱللَّهِ مِن قَبْلُ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴾، پێیان بڵێ: ئەدی بۆچی پێشتر پێغەمبەرانی خواتان دەكوشت ئەگەر بڕوادارن؟ هەڵبەتە ئەوانی سەردەمی پێغەمبەر ﷺ نەیانكوشتوونو ئەوانەی پێشێ كوشتوویانن، بەڵام خوای دادگەر بۆیە پاڵی داوەتە لای ئەوانیش، چونكە ئەوان لەڕێی ئەو بابو باپیرانەیان لایان نەداوەو هەر پێیانەوە پابەند نەبوون، بۆیە دەبنە شەریك لە كردەوەكانیاندا، ئەوە مانایەك، مانایەكی دی: ئەوانەی سەردەمی پێغەمبەریش ﷺ هەمیشە خەریكی نەخشەو پیلان بوون، كە پێغەمبەری كۆتایی ﷺ بكوژن، كەواتە: وەك كوشتبێتیان وایە، چونكە چەند جارێك پیلانو فێڵیان بۆ دانا: ژەهریان بۆ لە خواردن كرد، وە ویستیان بەرداشێكی بەسەردا بدەن، بەڵام خوای باڵادەست پاراستیو نەیهێشت نەخشەو پیلانەكەیان سەربگرێ، بۆیە بە پێی نیەتەكەی خۆیان گوناهەكەیان لەسەر تۆمار كراوە.

## چەند مەسەلەیەکی گرنگ

**مەسەلەی یەکەم:** کە دەفەرمویٚ: ﴿ وَقَفَّيۡنَا مِنۢ بَعۡدِهِۦ بِٱلرُّسُلِ ﴾ لە سوورەتی (المؤمنون)دا دەفەرمویٚ: ﴿ ثُمَّ أَرۡسَلۡنَا رُسُلَنَا تَتۡرَاۖ ...﴿٤٤﴾ ﴾، واتە: پەیتا پەیتا پێغەمبەرانی خۆمانمان نارد، وە لە سوورەتی (فاطر)دا دەفەرمویٚ: ﴿ ... وَإِن مِّنۡ أُمَّةٍ إِلَّا خَلَا فِيهَا نَذِيرٞ ﴿٢٤﴾ ﴾، واتە: هیچ کۆمەڵێك نەبووە، هیچ کۆمەڵگایەکی بەشەر نەبووە مەگەر ترسێنەرو ورياکەرەوەیەکی تێدا ڕەوانەکراوە، بۆ ئەوەی خەڵك بەڵگەو بیانووی نەبێ لەسەر خوا.

**مەسەلەی دووەم:** ﴿ رُوحُ ٱلۡقُدُسِ ﴾، واتە: گیانی پاك، کە مەبەست پێی جبریلە ؛، هەڵبەتە نەصرانیی یەکان لە ئینجیلەکانی خۆیاندا وشەی ﴿ رُوحُ ٱلۡقُدُسِ ﴾، بەکاردەهێنن وەك یەکێ لەسێ (ئوقنووم)ەکان ئەوان دەڵێن: عیسا، خوا، (رُوحُ القُدُس) سێ ئوقنوومەکان (الأقانيم الثلاثة)ن، واتە: سێ توخم پێکهێنەرن‌و بە هەرسێکیان یەك شت پێکدێنن، کە یەك شتیشەو سێ شتیشە ! دەجا وەرە کێ سەری لێ دەردەچێ ؟ سێ شت ببێ بە یەك شت !! دیارە نەصرانیی یەکان بۆخۆیان دەڵێن: ئەمە لەبەر ئەوەیە ئیمان هێندە قووڵە ئینسان سەری لێ دەرناچێ ! بەڵام لەڕاستیدا وانیە، بەڵکو خۆی لەخۆیدا شتێکی بێبناغەو ئەفسانەیەو، لەگەڵ عەقڵدا تێکدەگیرێ، بەڵێ جاری وا هەیە عەقڵ سەری لە هەندێ ڕاستییەکانی دین دەرناچێ، بەڵام هەرگیز لەگەڵ عەقڵ تێکناگیرێ، بۆ وێنە: هەردوو سیفەتی هەر بوویٚتی (أزلية)و هەرماوێتی (أبدية)ی خوا، لە عەقڵدا جێیان نابێتەوەو بۆی (إستعاب) ناکرێن، بەڵام لەهەمان کاتدا لەگەڵی تێکناگیرێن‌و دژ ناوەستن، لێرەشەوە، زانایانی ئیسلام گوتوویانە: (قَد يأتي الدينُ بمحارات العقول، ولكن لا يأتي بمحالات العقول)، واتە: ئایین جاری وایە شتی وا دێنی کە عەقڵەکان سەراسیمە دەکات‌و

تووشی سەرسوڕمان دەکات، بەڵام شتی وا نایەنێ کە لەگەڵ عەقڵەکان تێکبگیرێو بە مەحاڵی بزانن.

**مەسەلەی سێیەم:** کە خوای پەروەردگار (خۆ بەزلگەریی) و (ئارەزوو بازیی) بەیەکەوە باسکردوونە، وەك دەفەرموێ: ﴿ أَفَكُلَّمَا جَآءَكُمْ رَسُولُۢ بِمَا لَا تَهْوَىٰٓ أَنفُسُكُمُ ٱسْتَكْبَرْتُمْ ﴾، ئەوەی لێوەردەگیرێ کە خۆ بەزلگران بەزۆریی لە بەرانبەر شتێکدا خۆ بەزل دەگرن، کە دژی ئارەزوویانە، ئەگەرنا شتێك لەگەڵ ئارەزوویان، دەگونجێ بۆی دەبنە کۆیلەو خزمەتکارو ژێردەست، بەڵام دژی هەر شتێکن کە لەگەڵ ئارەزووەکانیاندا تێکبگیرێ، با ئەو شتە زۆر بەرزو چاكو پاکیش بێ.

**مەسەلەی چوارەم:** خوا ﷻ کوشتنی پێغەمبەرانی لەگەڵ بەدرۆ زانینی پێغەمبەراندا، بەیەکەوە باسکردوە، دەفەرموێ: ﴿ فَفَرِيقًا كَذَّبْتُمْ وَفَرِيقًا تَقْتُلُونَ ﴾ هەندێکیانتان بەدرۆ زانین‌و هەندێکیشیانتان کوشتن، کەواتە: دەست چوونە خوێنی پێغەمبەران، بەڵێ گوناهێکی زۆر گەورەیە، بەڵام بەدرۆ زانینی پێغەمبەرانیش، دیسان گوناهێکی زۆر گەورەیە.

**مەسەلەی پێنجەم:** کە گوتوویانە: ﴿ قُلُوبُنَا غُلْفٌ ﴾، وەك گوتمان دوو مانای هەن: یەکەم: دڵی ئێمە توورەکەی زانیارییەو پێویستییمان بە زانیاری تۆ نیە، دووەم: دڵمان لە توورەکە دایەو پێچراوە، وەك لە شوێنێکی دی دەفەرموێ: ﴿ وَقَالُوا۟ قُلُوبُنَا فِىٓ أَكِنَّةٍ مِّمَّا تَدْعُونَآ إِلَيْهِ ...﴿٥﴾ ﴾ فصلت، واتە: وە گوتیان دڵمان لەنێو کیفان دایەو پێچراوە، لە بەرانبەر ئەوەدا کە تۆ بانگمان بۆی دەکەی‌و، ئەو هیدایەتەی تۆ ناچێتە دڵمان، دەشگونجێ ئەمە لە ڕووی گاڵتە پێکردنەوە گوتبێتیان.

**مەسەلەی شەشەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ بَل لَّعَنَهُمُ ٱللَّهُ بِكُفْرِهِمْ ﴾، واتە: خوا بە هۆی کوفرەکەیانەوە نەفرینی لێکردن‌و دووری خستنەوە، کوفر شتێکە ئینسان

بۆخۆی بەدەستی دێنێ، (کفر)یش لە (ستر)ەوە هاتوە، یانی: داپۆشین‌و (کافر) یانی: داپۆشەر، وە کافر بۆیە پێی دەگوترێ: (کافر) چونکە ئەو حەقیقەتە ئیمانییەی خوای پەروەردگار لە فیطرەتیدا دایناوە، دەیشارێتەوە، ئنجا دوای ئەوەی کە ئەو بۆ خۆی لە خوا دوور دەکەوێتەوە، خوا زیاتری دوور دەخاتەوە، وەك چۆن کەسێك کە لە خوا نزیك دەبێتەوە، خوا زیاتر لێی نزیك دەبێتەوەو خوا زوڵم لە کەس ناکات.

**مەسەلەی حەوتەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ مُصَدِّقٌ لِّمَا مَعَهُمْ ﴾، ئەوەی کە لەگەڵ ئەوانەو بەوانە بەڕاستی دەزانێ، واتە: ئەسڵی تەورات بەڕاست دەزانێ، نەك ئەو تەوراتەی ئێستا کە دەستکاریی کراوەو گۆڕراوە، قورئان ئەوە بەڕاست نازانێ، هەڵبەتە تەورات ئێستاش شتی وای تێدا هەیە کە دژی قورئان نیەو، دیارە ئەوەی کە لەگەڵ قورئاندا دەگونجێ، قورئان ئەوە بەڕاست دەزانێ، بەڵام ئەوەی کە گۆڕراوە دەستکاریی کراوە، قورئان ئەوە بەڕاست نازانێ.

**مەسەلەی هەشتەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ فَلَمَّا جَآءَهُم مَّا عَرَفُواْ كَفَرُواْ بِهِۦ ﴾، تەماشا دەکەی جوولەکەکان زۆر عەودال‌و تامەزرۆ بوون تاکو پێغەمبەری کۆتایی بێ، کەچی کە هاتوە دژایەتییان کردوە، زۆرجار خەڵك وایە ئیددیعای مسوڵمانەتیی دەکات‌و ئیددیعای دینداریی دەکات، دوایی کە حەقیقەتێکی دینی بۆ ڕوون دەکەیەوە، کە لەگەڵ کلتورو کەلەپوور (موروثات)ی پێشێی تێکدەگیرێ‌و، لەگەڵ بەرژەوەندیی‌و لەگەڵ هەواو ئارەزووی تێکدەگیرێ، تەماشا دەکەی دژی ڕادەوەستێ ! کەواتە: هەر لە ئەسڵدا ڕاستی نەکردوەو عەودالی هەق‌و تامەزرۆی دۆزینەوەی هەق نەبووە.

**مەسەلەی نۆیەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ فَبَآءُو بِغَضَبٍ عَلَىٰ غَضَبٍ ﴾، تووڕەیی لەسەر تووڕەیی یان هەڵگرتەوەو بردەوە، ئەوە پێچەوانەی: ﴿ ...نُّورٌ عَلَىٰ نُورٍ... (٣٥) ﴾ النور، ئینسان ئەگەر بەرەو خوا هەنگاو بنێ، خوای بە بەزەیی ڕۆشنایی لەسەر ڕۆشنایی پێدەبەخشێ، بەڵام کاتێ پشت لە خوا دەکات، خوای دادگەر

ڕۆژ بە ڕۆژ زیاتر لێی تووڕە دەبێت، هەتا زیاتر هەڵوێستێکی خراپ دەنوێنێ، زیاتر خوا لێی تووڕە دەبێت.

**مەسەلەی دەیەم:** کە دەفەرموێ: ﴿قَالُواْ نُؤْمِنُ بِمَآ أُنزِلَ عَلَيْنَا﴾، ئەوە زۆر لەنێو مسوڵمانانـدا هەیە، هەندێ کەس دەمارگیریی (تَعَصُّب)ی هەیە بۆ شتێك، بۆ کتێبێك، بۆ زانایەك، بۆ مەزهەبێك، بۆ بۆچوونێك، تەنیا ئەوە بەڕاستو هەق دەزانێ، نەخێر دەبێ ئەوەی کە نێرراوی خوا ﴿مَا أَنْزَلَ اللهُ﴾یە هەمووی قەبووڵ بکەی، ئەگەرنا ئەوە وەك خوا دەفەرموێ: ﴿... كُلُّ حِزْبِۭ بِمَا لَدَيْهِمْ فَرِحُونَ ﴿٣٢﴾﴾ الروم، ی بەسەردا دەچەسپێ، وە لەڕاستییدا هەرکەس باش لە بەرنامەی خوا تێگەیشتبێو چاك لە زانیارییدا ڕۆچووبێ، لایەنگریی بۆ هەموو دینی خوای پەروەردگار هەیە، نەك تەنیا بۆ مەزهەبێكو زانایەكو ئیجتیهادێك، تەنیا ئەوە بەدین بزانێو ئەویدیکە لە دەرەوەی بازنە دابنێ!

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی هەژدەیەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان لە هەشت (٨) ئایەت پێکدێت، کە ئایەتەکانی: ژمارە (٩٢ تاکو ٩٩)ن، لە سوورەتی (البقرة)، خوا ﷻ لە دوو تویێی ئەم هەشت ئایەتەدا، هەندێکی دی لە هەڵوێستە خراپەکانی جوولەکەکان دەخاتەڕوو، وەك گوێلك پەرستیی کە پێشتریش باسکراوە، بەڵام لێرەدا بەچاویاندا دەداتەوە، هەروەها سەرپێچیی و لاملیی کردنیان لە فەرمانەکانی ئەو شەریعەتو بەرنامەیەی کە بۆیان نێرراوە، وە لاف لێدانی ئەوە کە بەهەشت لە دوارۆژدا تەنیا لە گرەوی ئەواندایەو، لەسەر ئەواندا تاپۆ کراوە، وە زیاد لە پێویست خۆشویستنی دنیا، وە بە دوژمن زانینی جوبرائیل ﷺ وە ئەوە کردنە بیانووی ئەوە کە ئیمان بە پێغەمبەری خاتەم ﷺ نەهێنن، کە جوبرائیل وەحی بۆ دێنێت!

﴿وَلَقَدْ جَآءَكُم مُّوسَىٰ بِٱلْبَيِّنَـٰتِ ثُمَّ ٱتَّخَذْتُمُ ٱلْعِجْلَ مِنۢ بَعْدِهِۦ وَأَنتُمْ ظَـٰلِمُونَ ﴿٩٢﴾ وَإِذْ أَخَذْنَا مِيثَـٰقَكُمْ وَرَفَعْنَا فَوْقَكُمُ ٱلطُّورَ خُذُوا۟ مَآ ءَاتَيْنَـٰكُم بِقُوَّةٍ وَٱسْمَعُوا۟ ۖ قَالُوا۟ سَمِعْنَا وَعَصَيْنَا وَأُشْرِبُوا۟ فِى قُلُوبِهِمُ ٱلْعِجْلَ بِكُفْرِهِمْ ۚ قُلْ بِئْسَمَا يَأْمُرُكُم بِهِۦٓ إِيمَـٰنُكُمْ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿٩٣﴾ قُلْ إِن كَانَتْ لَكُمُ ٱلدَّارُ ٱلْـَٔاخِرَةُ عِندَ ٱللَّهِ خَالِصَةً مِّن دُونِ ٱلنَّاسِ فَتَمَنَّوُا۟ ٱلْمَوْتَ إِن كُنتُمْ صَـٰدِقِينَ ﴿٩٤﴾ وَلَن يَتَمَنَّوْهُ أَبَدًۢا بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيهِمْ ۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌۢ بِٱلظَّـٰلِمِينَ ﴿٩٥﴾ وَلَتَجِدَنَّهُمْ أَحْرَصَ ٱلنَّاسِ عَلَىٰ حَيَوٰةٍ وَمِنَ ٱلَّذِينَ أَشْرَكُوا۟ ۚ يَوَدُّ أَحَدُهُمْ لَوْ يُعَمَّرُ أَلْفَ سَنَةٍ وَمَا هُوَ بِمُزَحْزِحِهِۦ مِنَ ٱلْعَذَابِ أَن يُعَمَّرَ ۗ وَٱللَّهُ بَصِيرٌۢ بِمَا يَعْمَلُونَ ﴿٩٦﴾ قُلْ مَن كَانَ عَدُوًّا

لِّجِبْرِيلَ فَإِنَّهُۥ نَزَّلَهُۥ عَلَىٰ قَلْبِكَ بِإِذْنِ ٱللَّهِ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ وَهُدًى وَبُشْرَىٰ لِلْمُؤْمِنِينَ ﴿٩٧﴾ مَن كَانَ عَدُوًّا لِّلَّهِ وَمَلَٰٓئِكَتِهِۦ وَرُسُلِهِۦ وَجِبْرِيلَ وَمِيكَىٰلَ فَإِنَّ ٱللَّهَ عَدُوٌّ لِّلْكَٰفِرِينَ ﴿٩٨﴾ وَلَقَدْ أَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ءَايَٰتٍۭ بَيِّنَٰتٍ ۖ وَمَا يَكْفُرُ بِهَآ إِلَّا ٱلْفَٰسِقُونَ ﴿٩٩﴾ ﴾

## مانـای وشـه به وشـەی ئایەتەکـان

((وە بێگومـان مووسـا بـە بەڵـگە ڕوونەکانـەوە هاتـە لاتـان (ئـەی جوولەکـەکان) کەچی دوای وی، کاتێك کە چوو بۆ وەرگرتنـی تەوڕات، ستەمکارانە گۆلکتان کـردە پەرستـراو ﴿٩٢﴾ وە یادبکەنـەوە کاتێـك پـەیمانتانمان وەرگـرتو (چـیای) طـووڕمـان بەسـەرتانەوە ڕاگـرتو پێمانگـوتن: ئـەو (بەرنامـەی)ەی پێمانـداون بـە تونـدیی بیگـرنو گـوێ بگـرن، کەچـی گوتیـان: بیـستمانو سەرپێـچییمان کـرد! وە خۆشەویـستی گۆلـك بـەهۆی کوفریانـەوە بـە دڵیانـدا خورابـۆوە: بڵـێ: (ئەگـەر بڕواداربن وەك ئیددیعا دەکەن) ئـەوە ئیمانەکـەتان فـەرمانتان بـە خراپتـرین شـت پێدەکـات! ﴿٩٣﴾ بڵـێ: ئەگەر ڕاستە مەنزلگای دواڕۆژ بەتایبەتو بە جیا لـە خەڵـك بۆ ئێوەیە، دەمـردن بـە خۆزگـە بخـوازن، ئەگـەر ڕاسـت دەکـەن ﴿٩٤﴾ بـەڵام بێگومـان هەرگیز مردن بە ئاوات ناخوازن، بـەهۆی ئـەوەوە کە دەستیان پێـشی خـستوە لـە کـردەوەی خـراپ، وە خوا بە ستەمکاران زانایـە ﴿٩٥﴾ وە بێگومـان تـۆ دەیـانبینی کە سـوورترین کەسـن لەسـەر هـەرجۆرە ژیانێـك تەنانـەت لـە هاوبـەش دانـەرەکانیش سوورترن، یەکێکیان حەز دەکات هەزار ساڵ تەمـەن بکـات، هەرچـەندە ئەگـەر ئـەو تەمەنەشی ببێ لە ئـازاری دۆزەخ لای نـادات، وە خـوا بینـەری ئەوەیـە کە دەیکـەن ﴿٩٦﴾ بڵـێ: هەرکەسێك دوژمـنی جیبـریلە، بـا بزانـێ کـە ئـەو بـە فـەرمانی خـوا قورئـانی دابەزاندۆتـە سـەر دڵـی تـۆ، کـە ئـەوەی پـێش خـۆی بەڕاسـت دەزانـێ، ڕێنمـایی‌و موژدەیـە بـۆ بـڕواداران ﴿٩٧﴾ هەرکەسێك دوژمـنی خـواو فریـشتەکانی‌و

پێغەمبەرانیو جیبریلو میکال بێت، ئەوە بێگومان (کافرە)و، خواش دوژمنی کافرانە ﴿٩٨﴾ وە بێگومان ئایەتی ڕوونمان بۆ لای تۆ ناردوونە خوارێ، کە جگە لە لادەران هیچ کەس پێیان بێبڕوا نابێ ﴿٩٩﴾)).

## شیکردنەوەی هەندێك لە وشەکان

(﴿بِٱلْبَيِّنَٰتِ﴾): (بَانَ واستَبَانَ و تَبَيّن) واتە: ڕوون بۆوە، کە (بَيِّنات) لەوەوە هاتوە، (والبَيّنَةُ: الدّلالَةُ الوَاضِحَة عَقلِيَةً كَانَتْ أو مَحْسُوسَةً)، (بَيِّنَة) ڕێنیشاندەرێکی ڕۆشنە چ ڕێنیشاندەری عەقڵیی بێ، چ هی بەرهەست بێ، دیارە (بَيِّنات) کۆی (بَيِّنة)یە، واتە: بەڵگە ڕۆشنەکان.

(﴿وَٱسْمَعُوا۟﴾): واتە: ببیستن، بەلام لێرەدا مەبەست پێی تێبگەن (إفهَمُوا) یاخود فەرمانبەری بکەن (أطِيعُوا)یە، چونکە: (السَّمْعُ: قُوَّة فِي الأذُنِ بِهِ يُدرِكُ الأَصْوَات و فِعلُه: السَّمْع) واتە: (سمع) هێزێکە لە گوێدا کە ئینسان دەنگەکانی پێ دەبیستێ، ئنجا کردەوەکەیشی پێی دەگوترێ: (سَمْع)، جاری واش هەیە مەبەست لە بیستن تێگەیشتنە، وە جاری واش هەیە مەبەست پێی طاعەتو فەرمانبەریی کردنە.

(﴿وَأُشْرِبُوا۟ فِى قُلُوبِهِمُ ٱلْعِجْلَ﴾): مەبەست لەم ڕستەیە دوو شتە:

١/ عەرەب دەڵێن: (أَشْرَبْتُ البَعِيرَ: أي شَدَدْتُ حَبْلاً فِي عُنُقِهِ)، واتە: پەتێکم لە ملی حوشترەکە قایم کرد، واتە: گوێلك بەدڵیانەوە شەتەك درا بوو، بەدڵیانەوە بەسترابوو کە کاتی خۆی گوێلکیان پەرست ئەو گوێلکە وەك بڵێی بە پەتێکەوە بەدڵیانەوە گرێدرابوو، ئەوەندە خۆشیان دەویست.

٢/ یاخود لێرەدا وشەیەك پەرێنراوە، کە سیاق دەلالەتی لەسەر دەکاتو بریتییە لە (حُبّ) بەمجۆرە (أُشرِبَ حُبُّ العِجْلِ فِي قُلُوبِهِم)، واتە: خۆشویستنی گوێلك بە دڵیاندا کرابوو، وەك خواردنەوەیەك.

(بِئْسَمَا)؛ (أَصْلُ بِئْسَ: بَئِسَ وهُوَ مِنَ البُؤْسِ) واتـە: خراپتـرین شت، چونکە وشـەی (بِئْسَ) لـە (بَئِسَ)ەوە هـاتوە، ئـەویش لـە (بُؤْس)ەوە هـاتوە، واتـە: خراپتـرین نارەحەتیی.

(خَالِصَةً)؛ واتە: ساغو خاڵیی لە خڵتە (الْخَالِصُ كَالْصَافِي إلاّ أَنَّ الخَالِصَ مَا زَالَ عَنهُ شَوْبُهُ بَعْدَ أَنْ كَانَ فِيهِ يُقَالُ: خَلّصتُهُ فَخَلَصَ) واتە: (خَالِص)، وەك (صافِي)، وایە، بەڵام جیاوازییەکەیان ئەوەیە کە (خَالِص) خڵتەی لەگەڵ بێو لێی جیاکرابێتەوە، یاخود شتێکی غەریبی لەگەڵ بووبێو لێی جیاکرابێتەوە، بەڵام (صافِي) ئەوەیە کە هەر لە ئەسڵدا صاف بووبێت، دەگوترێ: (خَلَّصْتُهُ فَخَلَصَ) واتە: ساغم کردەوە، یاخود پاڵاوتمو ساغو صاف بۆوە.

(فَتَمَنَّوُاْ)؛ (التَمَنّي: تَقْدِيرُ شَيءٍ فِي النَّفْسِ وتَصُّوره فِيهَا) (تَمَنِّي) ئەوەیە کە ئینسان شتێك لەدڵی خۆیدا وێنا بكات، واتە: خۆزگە بە شتێك خواستن.

(أَحْرَصَ)؛ (الحِرصُ: فَرْطُ الشَّرهِ وفَرْطُ الإرَادَة)، (حِرْص) ئەوەیە کە ئینسان زۆر ئارەزووی لە شتێك بێتو زۆر بەتەمای شتێك بێ، (أحرَصَ) یانی: سوورتر لەسەر هەبوونی شتێك.

(بِمُزَحْزِحِهِۦ)؛ واتـە: لادان، چونکـە (زَحْزَحَ)، واتـە: (أزال) لایـدا.

(قَلْبِكَ)؛ (قَلْب)، واتـە: دڵ، (قَلْبُ الشَّيءِ: تَصرِيفُهُ وصَرْفُهُ عَن وَجْهٍ إلَى وَجْهٍ وَسُمِّي القَلْبُ قَلْبَاً لِتَقَلُّبِهِ)، (قَلْب) بریتیـە لەلادانی شتێك لـە لایەك بەرەو لایەك، وە دڵ بۆیـە ناونراوە دڵ، چونکە لە حاڵێکەوە بۆ حاڵێك دەگۆڕێ.

(بِإِذْنِ ٱللَّهِ)؛ (الإذْنُ فِي الشَّيءِ: إعلاَم بإجَازَته والرُّخْصَة فِيهِ)، (إذنْ) بریتیـە لـە ئاگادارکردنەوە کـە ئیجـازەو مۆڵـەت هەیـە ئـەو شـتە بکرێ، جا جـاری وا هەیە وشـەی: (بِـإذنِ الله)، واتە: بە مۆڵەتی خوا، وە جاری وا هەیـە مەبەست پێـی ئیـرادەو ویـستی خوایـە، دیـارە (إذْن)ی شـەرعییمان هەیـەو (إذْن)ی

کەونییمان هەیە، (إذْن)ی شەرعیی، ئەوەیە کە خوا لە شەرعی خۆیدا ڕێگای دابێ بە شتێك، وە (إذْن)ی کەونیی یان قەدەریی، ئەوەیە کە خوای زاناو توانا خواستو ویستی لەسەر شتێك بوو بێت.

## هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتەکان

١) هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو ئایەتەی کە دەفەرموێ: ﴿ قُلْ مَن كَانَ عَدُوًّا لِّجِبْرِيلَ فَإِنَّهُ نَزَّلَهُ عَلَىٰ قَلْبِكَ بِإِذْنِ اللَّهِ ﴾، {عَنْ ابْنِ عَبّاسٍ رضي الله عنه قَالَ: أَقْبَلَت يَهُودُ إلى النَّبيّ ﷺ فَقَالوا: يَا أَبا القَاسم، نَسْئَلُكَ عَن أشياء، فإن أجبتَنا فِيهَا اتبعناك، أخْبِرنَا مَن الَّذي يَأتيَكَ مِنَ المَلائِكَة؟ فإنهُ ليسَ مِن نَبيّ إلاّ يأتيهُ مَلَك مِن عِندَ رَبّهِ ﷻ بالرِسَالَة و بالوَحِي، فَمَنْ صَاحِبُكَ؟ قَالَ: جبريل، قَالوا: ذَاكَ الَّذي يَنزِلُ بالحَرب و بالقِتَال، ذَاكَ عَدُّونَا، لَوْ قُلْتَ: مِيكَائِيل الَّذي يَنْزِلُ بالقَطْر والرَّحمَة، اتَّبَعناكَ فَأَنْزَلَ الله تَعَالَى: ﴿ قُلْ مَن كَانَ عَدُوًّا لِّجِبْرِيلَ فَإِنَّهُ نَزَّلَهُ عَلَىٰ قَلْبِكَ بِإِذْنِ اللَّهِ ﴾، (أسبَاب النزُول لِلنَّيسابوري، ص: (١٨)، رَوَاهُ أَحْمَد برقم: (٢٤٨٣)، والتِّرمِذِيّ برقم: (٣١١٧)}، واتە: هەندێ لە جوولەکەکان هاتن بۆ لای پێغەمبەر ﷺ گوتیان: ئەی بابی قاسیم! هەندێ شتت لێ دەپرسین، ئەگەر وەڵامتداینەوە شوێنت دەکەوین، هەواڵمان بدەیە کێ وەحی بۆ تۆ دێنێ لە فریشتەکان؟ چونکە هیچ کام لە پێغەمبەران نەبووە، مەگەر فریشتەیەك وەحیو بەرنامەی بۆ هێناوە، جا ئایا ئەو فریشتەیەی دێ بۆلای تۆ کامەیە؟ ئەویش فەرمووی: (جیبریل)ە، (دیارە جیبریل سەرۆکی ئەو فریشتانەیە کە وەحیو پەیام بۆ پێغەمبەران دەێنن، وە بۆلای هەموو پێغەمبەران هەر ئەو بووە)، گوتیان: ئەوە ئەو کەسەیە کە فەرمان دەکات بە جەنگو بە کوشتار، ئەوە دوژمنی ئێمەیە، ئەگەر گوتبات: میکائیل کە سەرپەرشتیی باران بارینو دابەزینی بەزەیی خوایە، شوێنت دەکەوتین، (دیارە ئەوە بەس بیانووگرتن بووە).

**٢) هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو ئایەتەی، کە دەفەرموێ:** ﴿ وَلَقَدْ أَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ءَايَٰتٍۭ بَيِّنَٰتٍۢ ۖ وَمَا يَكْفُرُ بِهَآ إِلَّا ٱلْفَٰسِقُونَ ﴾، {(قَالَ ابْنِ عَبَّاسٍ هَذَا جَوَابٌ لأَبن صُورِيَا، حِينَ قَالَ لِرَسُولُ الله يا مُحَمّد مَا جِئتَنَا بِشَيءٍ نَعْرِفُهُ وما أُنْزِلَ عَلَيْكَ مِن آيَةٍ بَيِّنَةٍ فَنَتَّبِعُك بِها، فَأنْزَلَ الله هَذهِ الآيَةَ)}، واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس خوا لێیان ڕازی بێ دەڵێ: ئەم ئایەتە وەڵامی (ابن صوريا)یە، - یەکێك بوو لە زانایانی جوولەکە - کە هاتە لای پێغەمبەر ﷺ گوتی: ئەی موحەممەد ! تۆ هیچ شتێکت پێ نیە کە لەسەر بناغەی ئەوە شوێنت بکەوین، وە تۆ هیچ موعجیزەو بەڵگەیەکت نەهێناوە! تاکو بەهۆیەوە شوێنت بکەوین، خواش ئەم ئایەتەی ناردە خوار.

دیارە جوولەکەکان زۆرجار لە بیانوو گەڕاون، بۆ پاساودانەوەی هەڵوێستی خۆیان، وە بۆ ئەوەی دوایی جەنگێکی ئیعلامیی دروست بکەن لە دژی پێغەمبەر ﷺ ئەو جۆرە مشتومڕانەیان لەگەڵ پێغەمبەردا کردوە، ئەگەرنا زانیویانە کە موحەممەد پێغەمبەری خوایە، ئەوە لەلایەك لەلایەکی دی، ئەوان هەڵساون لێرەدا ئەوەیان کردۆتە بیانوو، کە تۆ بۆچی موعجیزەیەکی بەرهەستت پێ نیە؟ وەك چۆن مووسا عليه السلام گۆچانی پێبوو دەبوو بە ئەژدیها، وە دەستی لەبن هەنگڵی دەنا وەك گڵۆپ دادەگیرسا، وە چەندان موعجیزەی دیکە، وە عیسا عليه السلام مردووی زیندوو دەکردەوەو، نەخۆشی گول (گەڕ)و بەڵەك و کوێری زگماکی چاك دەکردەوە، بەڵێ ئەوان داوای ئەو جۆرە موعجیزانەیان لە پێغەمبەر دەکرد ﷺ، بێخەبەر لەوە کە موحەممەد پێغەمبەری هەموو بەشەریەتە، بۆیە خوا شتێکی بۆ کردۆتە بەڵگەو موعجیزە، کە هەتا بەشەریەت لەسەر زەوی بمێنێ، ئەو بەڵگەو موعجیزەیەش دەمێنێ، کە قورئانە، بەڵام ئەگەر خوا ﷻ موعجیزەی وەك هی پێغەمبەرانی دیکەی بە پێغەمبەری ئێمە دابایە، بۆ ئیسپاتی پێغەمبەرایەتییەکەی، ئەوە بە مردنی خۆی ئۆممەتەکەی بەڵگەی بەدەستەوە نەدەما، بۆ ئیسپاتی پێغەمبەرایەتی موحەممەد ﷺ، ئەگەرنا بێگومان

پێغەمبەری ئێمە ﷺ موعجیزەی دیکەی بوون، بەلام بۆ ئیسپاتی پێغەمبەرایەتی خۆی تەنیا قورئانی بە بەڵگە هێناوەتەوە.

## مانای گشتی ئایەتەکان

خوا ﷻ لەسەر سەرزەنشتکردنو هەڵەو کەموکووریی پێشینانیان خستنەوە بەرچاوی جوولەکەکانی رۆژگاری پێغەمبەری خاتەم ﷺ بەردەوامە، لە سۆنگەی ئەوەوە کە زۆر خۆیان بەو رابردووەو بەو پێشینانەیانەوە هەڵکێشاوەو شانازیی یان پێوە کردوون ! خوای کاربەجێش ئەو راستییانەیان بیردەخاتەوە لەبارەی رابردوویانو پێشینانیانەوە، تاکو لەو لەخۆبایی بوون (غرور)و خۆبەزلگریی و خۆپەسندییەیان بێنێتە خوارێ، بۆیە روو لە جوولەکەکانی سەردەمی پێغەمبەرو ﷺ ئەوانەی ئێستاش دەکاتو دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدۡ جَآءَكُم مُّوسَىٰ بِٱلۡبَيِّنَٰتِ ثُمَّ ٱتَّخَذۡتُمُ ٱلۡعِجۡلَ مِنۢ بَعۡدِهِۦ وَأَنتُمۡ ظَٰلِمُونَ ﴾، بێگومان مووسا بە بەڵگەو موعجیزەی ئاشکراوە هاتە لاتان، ئنجا دوای ئەوەش، واتە: دوای ئەوەی کە ئەو هەمووە موعجیزەو بەڵگەی بۆ هێنابوون، یاخود دوای ئەوەی کە چوو تەورات وەرگرێ لە خوای پەروەردگار، هەتا هاتەوە ئێوە گۆلکتان پەرستو ئێوە ستەمکاربوون، پاشان دەفەرموێ: ﴿ وَإِذۡ أَخَذۡنَا مِيثَٰقَكُمۡ وَرَفَعۡنَا فَوۡقَكُمُ ٱلطُّورَ ﴾، وە یادبکەنەوە ئەو کاتەی پەیمانمان لێتان وەرگرت، وە کێوی طوورمان بەسەر سەرتانەوە راگرت، وەك لە دەرسەکانی رابردوودا باسمان کرد، کە ئایا پابەند دەبن بە تەوراتەوەو، بە برگەکانی ئەو پەیمانەوە کە لێتان وەردەگیرێ، کە نێوەرۆکی ئەو برگانەش هەر لە تەورات دایە، دیارە ئەوکاتە گوتوویانە: بەڵێ، بۆیە دەفەرموێ: ﴿ خُذُواْ مَآ ءَاتَيۡنَٰكُم بِقُوَّةٖ وَٱسۡمَعُواْ ﴾، پێمانگوتن: ئەوەی پێمانداون ئەو بەرنامەو شەریعەتە، بە جیددیی و بە توندیی وەریبگرن، (واتە: لێی تێبگەن یاخود: فەرمانبەریی بکەن)، ﴿ قَالُواْ سَمِعۡنَا

وَعَصَيْنَا ﴾، گوتیان: (واتە: جوولەکەکانی سەردەمی مووسا ﷺ وە دوایش بە درێژایی ژیانیان هەر ئەوە هەڵوێستی کردەییان بووە) بیستمانو سەرپێچییمان کرد، لێرەدا زانایان دەڵێن: ئەوە بە زمانی حاڵ خوای زانا بەسەرهاتی ئەوان دەگێڕێتەوە، واتە: بە زمانی حاڵ، گوتیان: ئەوە بیستمان، بەڵام بەقسەمان نەکردی، ﴿ وَأُشْرِبُوا۟ فِى قُلُوبِهِمُ ٱلْعِجْلَ بِكُفْرِهِمْ ﴾، وە گوێلکیان بە دڵەوە نووسابووو شتەتەك درابوو، یاخود خۆشەویستی گوێلکیان وەك خواردنەوەیەك پێ خواردرابۆوە، وەك ئەوەی شتێك بەتۆبزیی بە گەروویاندا بکرێ، بەهۆی کوفرو بێبڕواییانە، ﴿ قُلْ بِئْسَمَا يَأْمُرُكُم بِهِۦٓ إِيمَـٰنُكُمْ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴾، ئەی پێغەمبەر ﷺ وە هەر مسوڵمانێك کە لەگەڵ جوولەکەدا قسان دەکەی ! بڵێ: خراپترین شت ئەوەیە کە ئیمانتان فەرمانتان پێدەکات، ئەگەر ڕاست بکەن ئیماندارین ! بۆیە وا دەفەرموێ: چونکە جوولەکە ئێستاش لەگەڵ دابێ، خۆیان لە هەمووکەس بە ئیماندارتر دەزانن و دەڵێن: ئێمە ئیمانداریــن و ئەگەر ئیماندار هەبن هەر ئێمەین ! وەختی خۆیشی بە پێغەمبەر ﷺیان دەگوت: تۆ بۆ چیمان بانگ دەکەی ؟ ئێمە لە پێش تۆدا ئیمانمان هێناوە، لەپێش تۆدا کتێبمان زانیوە، جا خوا دەفەرموێ: ئەگەر ئیمان ئەوەبێ کە فەرمانتان پێدەکات گوێلك بپەرستن و سەرپێچیی فەرمانی خوا بکەن، ئەوە خراپترین شت ئەو ئیمانەیە، کە ئەو فەرمانە خراپەتان پێدەکات، واتە: ئەوە ئیمان نیە، ئیمان دەبێت ئینسان وا لێبکات کە کردەوەی چاك بکات، ئیمان دەبێ ئینسان ڕێكو ڕاستبکاتو، پاكو چاکی بکاتو، سەر ڕاستی بکات، بەڵام کە مرۆڤ لارو خوارو پیسو پۆخڵو ناهەموارو نالەبار بوو، مانای وایە هەرچەندە ئیددیعای ئیمان بکات، لێی ناسەلمێنرێت، چونکە شوێنەواری ئیمانی پێوە نابینرێ، ئنجا ئیددیعایەکی دیکەیان ئەوەبوو دەیانگوت: لە دوارۆژدا بەهەشت هەر لەسەر ئێمە تاپۆکراوەو هەر ئێمە دەچینە بەهەشت، جا خوا (جلَّ شأْنُهُ) دەفەرموێ: ﴿ قُلْ إِن كَانَتْ لَكُمُ ٱلدَّارُ ٱلْـَٔاخِرَةُ عِندَ ٱللَّهِ خَالِصَةً مِّن دُونِ ٱلنَّاسِ

﴿ فَتَمَنَّوُاْ ٱلْمَوْتَ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴾، پێیان بڵێ: ئەگەر مەنزڵگای دوارۆژ لەلای خوا تایبەتە بە ئێوەوەو بەشی کەسی دیکەی پێوەنیە، مردن بە خۆزگە بخوازن ئەگەر ڕاست دەکەن، واتە: هێندە لە مردنێ مەترسێن‌و، ئەوەندە ژیانی دنیاتان خۆش نەوێ، تۆ کە دڵنیای ئەگەر بچیە خزمەت خوا، میوانداریت دەکات‌و دەتخاتە بەهەشت، نابێ لە مردن بترسێی، کەچی ئەی جوولەکەکان کە ئێوە هێندە لە مردنێ دەترسێن‌و هێندە ژیانی دنیاتان خۆشدەوێ، ئەوە بەڵگەو نیشانەی ئەوەیە کە ڕاست ناکەن، ئەو قەناعەتەتان نیە کە بەهەشت بۆ ئێوە دانرابێ‌و ئەوە تەنیا ئیددیعایەکە دەیکەن، بۆ ئەوەی عەوامەکان‌و خەڵکە سادەکەتان چەواشە بکەن‌و، بڕوا بە پێغەمبەری کۆتایی نەهێنن ﷺ، بۆیە دەفەرموێ: ﴿ وَلَن يَتَمَنَّوْهُ أَبَدًۢا بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيهِمْ ﴾، وە هەرگیز ئەوانە مەرگ‌و مردن بە ئاوات ناخوازن، بەهۆی ئەو کردەوانەوە کە دەستیان پێشی خستوە، واتە: بە هۆی پەرێزی پیسیانەوە، هەرگیز حەز بە چارەی مردن ناکەن، ﴿ وَٱللَّهُ عَلِيمٌۢ بِٱلظَّٰلِمِينَ ﴾، وە خوا زانایە بەستەمکاران، ئەوانیش هەم زوڵمیان لە خۆیان کردوە، وە هەم لەوەش کە جوولەکە ئیددیعا دەکەن، شوێنی کەوتوون، کە شەریعەتی مووسایە، وە لە پێغەمبەری کۆتایی ﷺیش، کە خەڵکی لە بەرانبەریدا تووشی چەواشەکاریی دەکەن، تاکو ئیمانی پێ نەهێنن، پاشان باسی هەڵوێستێکی دیکەیان دەکات‌و، دەفەرموێ: ﴿ وَلَتَجِدَنَّهُمْ أَحْرَصَ ٱلنَّاسِ عَلَىٰ حَيَوٰةٍ وَمِنَ ٱلَّذِينَ أَشْرَكُواْ ﴾، وە تۆ دەبینی ئەوانە سوورترین کەسن لەسەر هەر جۆرە ژیانێك (بەس بژین)، تەنانەت لەوانەش کە هاوبەشیان (بۆ خوا) داناوە، ﴿ يَوَدُّ أَحَدُهُمْ لَوْ يُعَمَّرُ أَلْفَ سَنَةٍ ﴾، یەکێکیان (یان هەر کامێکیان) بە خۆزگە دەخوازێ، کە هەزار ساڵ تەمەنی بێ ﴿ وَمَا هُوَ بِمُزَحْزِحِهِۦ مِنَ ٱلْعَذَابِ أَن يُعَمَّرَ ﴾، هەرچەندە ئەگەر هەزار ساڵیش بژیێ، ئەو تەمەنە درێژە هەر لە ئاگری لانالداو دووری ناخاتەوە ﴿ وَٱللَّهُ بَصِيرٌۢ بِمَا يَعْمَلُونَ ﴾، وە خوا بینەری ئەوەیە کە ئەنجامی دەدەن، وە

هەڵوێستێکی دیکەیان ئەوە بوو، کە ئەوەیان بە بیانوو دەهێنایەوە: بۆیە ئیمان بە پێغەمبەری کۆتایی ناهێنن، چونکە ئەو پەیکەی کە وەحی بۆ دێنیو، ئەو نوێنەرەی کە لەنێوان ئەوو خوا دایە، جیبریلە عليه السلام وە دەیانگوت: جبیریل فەرمانی جەنگو کوشتاری هێناوە لە خواوەو، دوژمنی ئێمەیە، ئنجا لەبەر ئەوەی بە دوژمنی ئێمەدا پەیامی خوات بۆ دێ، ئێمە شوێنت ناکەوین ! هەڵبەتە ئەوە بیانوویە، ئەگەرنا هەرکەسێ خوا بیکات بە نوێنەری خۆی، تۆ دەبێ دۆستت بێ، ئەگەر خۆت بە بەندەی خوا دەزانی، بۆیە دەفەرموێ: ﴿ قُلْ مَن كَانَ عَدُوًّا لِّجِبْرِيلَ فَإِنَّهُۥ نَزَّلَهُۥ عَلَىٰ قَلْبِكَ بِإِذْنِ ٱللَّهِ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ وَهُدًى وَبُشْرَىٰ لِلْمُؤْمِنِينَ ﴾، بڵێ: هەرکەسێك دوژمنی جیبریلە (کە سەرۆکی هەموو فریشتەکانە، وە سەرۆکی ئەو فریشتانەیە کە وەحی دێنن) ئەوە بابزانن کە جیبریل بە فەرمانی خواو بە مۆڵەتی خوا قورئانی دابەزاندۆتە سەر دڵی تۆ، کە ئەوەی پێش خۆی (واتە: هەموو کتێبەکانی پێش خۆی) بەڕاست دەزانی، وە ڕێنماییو موژدەیە بۆ بڕواداران، ﴿ مَن كَانَ عَدُوًّا لِّلَّهِ وَمَلَٰٓئِكَتِهِۦ وَرُسُلِهِۦ وَجِبْرِيلَ وَمِيكَىٰلَ فَإِنَّ ٱللَّهَ عَدُوٌّ لِّلْكَٰفِرِينَ ﴾، وە هەرکەسێك دوژمنی خواو فریشتەکانیو پێغەمبەرانیو جیبریلو میکال بێ، ئەوە بە تەئکید کافرەو خواش دوژمنی کافرانە، یانی: هەرکەسێك دوژمنی فریشتەکانی خوا بێ، ئەوە دوژمنی خوایەو هەرکەسێ دوژمنی یەکێ لە پێغەمبەرانی خوا بێ، ئەوە دوژمنی خوایە، ﴿ وَلَقَدْ أَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ءَايَٰتٍۭ بَيِّنَٰتٍ ۖ وَمَا يَكْفُرُ بِهَآ إِلَّا ٱلْفَٰسِقُونَ ﴾، وە بە تەئکید ئێمە ئایەتە ڕۆشنەکانمان بۆ لای تۆ ناردوون (ئایەتەکانی قورئان نیشانەی زۆر ڕۆشنن کە تۆ پێغەمبەری خوای)، وە هیچ کەسێ پێیان بێبڕوا نابێت، مەگەر لادەربێ، لادەربێ لە حوکمی عەقڵ، لە حوکمی عیلم، لە فیطرەتی خۆی، وە لادەربێ لە پەیامو بەرنامەی هەموو پێغەمبەران (صَلَى اللهُ عَلَيهِم وَسَلَم).

## چەند مەسەلەیەکی گرنگ

**مەسەلەی یەکەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْكِتَٰبَ وَقَفَّيْنَا مِنۢ بَعْدِهِۦ بِٱلرُّسُلِ ﴾ مەبەست لێرەدا ئەوەیە کە هەڵوێستتان لە بەرانبەر موحەممەددا ﷺ، هەرهەمان هەڵوێستتانە کە لە بەرانبەر مووسادا ﷺ هەتانبوو، مووساش ﷺ زۆر موعجیزەو بەڵگەی ئاشکرای بۆ هێنان، کەچی سەرپێچییتان لە فەرمانی کرد، کەواتە: موحەممەدیش ﷺ ئیمان هێنان پێی پەکی لەسەر موعجیزەو بەڵگەیەکی دیکە نەکەوتوە، بەڵکو هەرناتانەوێ ئیمان بێنن، وەك چۆن ئیمان هێنانتان بە مووسا پەکی لەسەر موعجیزەو بەڵگە نەکەوتبوو، بەڵگەو موعجیزەی زۆری بۆ هێنان، کەچی هەر سەرپێچیی‌و لاملییتان کرد.

**مەسەلەی دووەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ خُذُواْ مَآ ءَاتَيْنَٰكُم بِقُوَّةٍ وَٱسْمَعُواْ ﴾، ئەوەی لێ وەردەگیرێ، کە شەریعەت‌و کتێبی خوا، **یەکەم:** دەبێ بەجیددیی‌و بەهێز، وە بەتوندیی وەربگیرێ، نەك بە دەستێکی شل کە هەر خۆت لێبدەن بکەوێتە خوار، یان بە هەڕەشەیەك، یان بە تەماعێك دەستی لێبەربدەی! دەبێ توند بیگری، **دووەم:** وە پاشان دەبێ بە تێگەیشتنەوە، وە بە پابەندییەوە بێ، وەك پێشتر چەمك‌و واتای بیستن (واسمَعوا)مان ڕوونکردەوە.

**مەسەلەی سێیەم:** کە گوتوویانە: ﴿ قَالُواْ سَمِعْنَا وَعَصَيْنَا ﴾، وا پێدەچێ، کە خوا ﷻ لێرەدا وەك بڵێی حاڵەتی کردەیی ئەوان بگێڕێتەوە، واتە بە زمانی حاڵ گوتیان: ئەوە بیستمان، بەڵام بە قسەشت ناکەین!

**مەسەلەی چوارەم:** کە خوا چەند جارێك دەفەرموێ: ﴿ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴾، ئاماژەیە بەوە کە ئەگەر ئینسان ئیمانی هەبێ، ئیمان ئینسان ڕاستە ڕێ دەکات بەرەو چاکە، وە کردەوەی چاکی پێدەکات‌و دڵ وەدەچەرخێنێ بەرەو طاعەتی خوا، کەواتە: هەر کاتێك ئینسان ڕوو لە خێر نەبووو، ڕوو لە چاکە نەبووو، پابەندنەبوو بە شەریعەتی خواوە، مانای وایە ئیمانی نیە، سەرچاوە ئەگەر

بەڕاستی سەرچاوەیەکی چاك بێ، ئاوی زوڵاڵ‌و صافی لێ هەڵدەقوڵێ، ئینسان ئەگەر بەڕاستی ئیمانی هەبێ، ئەوە کردەوەی چاك، ئاوێکە لە سەرچاوەی ئیمانەوە هەڵدەقوڵێ.

**مەسەلەی پێنجەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ قُلْ إِن كَانَتْ لَكُمُ ٱلدَّارُ ٱلْءَاخِرَةُ عِندَ ٱللَّهِ خَالِصَةً مِّن دُونِ ٱلنَّاسِ فَتَمَنَّوُا۟ ٱلْمَوْتَ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴾، ئەگەر ڕاست دەکەن مەنزڵگای دوارۆژ تەنیا بۆ ئێوە دانراوە، مردن بەئاوات بخوازن، ئەوەی لێوەردەگیرێ کە بەڕاستی ئینسانێ ئیمانی بە خوابێ‌و ئیمانی بە دوارۆژبێ، هەرگیز لە مردن ناترسێ، وە مردن وەك میوانێك تەماشا دەکات، وە هەرکەسێ زۆر لە مردن ترسا، بابزانێ ئیمانی بە دوارۆژ پتەو نیە، یاخود جاری وا هەیە ئیمانی بە دوارۆژ پتەوە،[1] بەڵام کردەوەی باشی نیەو پەرێزو بەرهەمی باشی نیەو لە سزای کردەوەکانی خۆی دەترسێ، بەڵام هەرکەسێ کردەوەی باشی هەبوو، ئیمانیشی پتەو بوو بە دوارۆژ، بە دڵنیایی لە مردن ناترسێ، بەڵێ، هەرکەسێ پەرێزی پاك بوو بەرچاویشی ڕووناك دەبێ‌و بێباك دەبێ.

**مەسەلەی شەشەم:** جوولەکەکان گرفتێکی زۆر گەورەیان ئەوەبوو کە زۆر خۆ پەسند بوون، ئەوەتا لێرەدا دەڵێن: مەنزڵگای دوارۆژ هەر بۆ ئێمە دانراوە! جا ئەوە هەمووی بۆ ئێمە جێگای عیبرەتە، کە ئینسان نابێت خۆ پەسندبێ‌و وابزانێ کە قیامەت هەر لە گرەوی وی دایەو، بەهەشت هەر چاوەڕێی وی دەکات! بەڵکو ئینسانی ئیماندار هەمیشە دەبێ ترسیشی هەبێ‌و ئومێدیشی هەبێ، ئومێدی هەبێ بە ڕەحمەتی خوا، وە ترسیشی هەبێ لە دادگەری خوا ﷻ، کە بەهۆی کردەوە خراپەکانییەوە تووشی سزابێ.

**مەسەلەی حەوتەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ وَلَتَجِدَنَّهُمْ أَحْرَصَ ٱلنَّاسِ عَلَىٰ حَيَوٰةٍ وَمِنَ ٱلَّذِينَ أَشْرَكُوا۟ ﴾، واتە: وە دەیانبینی کە سوورترین کەسن لەسەر هەرجۆرە

---

١) هەرچەندە هەرکات مرۆڤ بڕوای بەخواو بە دوارۆژ پتەو بوو، کردەوەی باشیشی دەبن، ئەو دووانە مەگەر چۆن دەنا لەیەك دانابڕێن.

ژیانێك وە لە هاوبەش بۆ خودا دانەرەکانیش سوورترین، لێی وەردەگیرێ کە هەرکەسێکت بینی، هەر کوتەی ژیانی بوو، هەرجۆرە ژیانێك، ئەوە بە حەقیقەت شێوەی جوولەکەکانی هەیە، ئینسانی ئیماندار دەبێ بیەوێ ژیانێکی مسوڵمانانە بژیێ، ژیانێکی سەربەرزانە بژیێ، بەڵام ژیانێکی دوور لە خواو ژیانێکی گوناهکارانەو زەبوونانەو ژێردەستانە، نابێ لەسەری سووربێ داواکاری بێ.

**مەسەلەی هەشتەم:** وەك باسمکرد خوا ﷻ بە جوولەکەکان دەفەرموێ: ئێوە کە ئیددیعای ئەوە دەکەن کە جیبریل دوژمنتانە، کەواتە: ئێوە دوژمنی خوان، جا ئەوە لێی وەردەگیرێ، کە کەسێك بەڕاستی خوای خۆشبوێ، دۆستەکانی خواشی خۆشدەوێن، دۆستەکانی خواش فریشتەکانن، پێغەمبەرانن، ئیماندارانن، کەواتە: هەرکەسێ ئیماندارانی بەگشتی خۆشنەویست، یان کۆمەڵێك لە مسوڵمانانی خۆشنەویست، لەبەر مسوڵمانەتییەکەیان، دەبێ لە ئیمانی خۆی بترسێو، مانای وایە ئەو کەسە پەیوەندیی لەگەڵ خوا چاك نیە، چونکە کەسێك بەڕاستی خوای خۆشبوێ، دۆستەکانی خواشی خۆشدەوێن.

خوای پەروەردگار لەو کەسانەمان بگێڕێ کە ئیمانداری باشن، وە وامان لێبکات، کە تێکڕای دۆستەکانی خواشمان خۆشبووێن.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی نۆزدەیەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان چوار (٤) ئایەت دەگرێتە خۆی، ئایەتەکانی: (١٠٠ هەتا ١٠٣)، لەم ئایەتانەدا خوا ﷻ باسی پەیمان شکێنیی جوولەکەکانمان بۆ دەکات، وە باسی پابەندنەبوونیان بەو کتێبەوە کە خوای پەروەردگار بۆی ناردوون، وە پاشان باسی ئەوەمان بۆ دەکات، کە چۆن بەدوای جادووو بەدوای جادووگەران کەوتوون.

﴿أَوَكُلَّمَا عَاهَدُوا۟ عَهْدًا نَّبَذَهُۥ فَرِيقٌ مِّنْهُم ۚ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿١٠٠﴾ وَلَمَّا جَآءَهُمْ رَسُولٌ مِّنْ عِندِ ٱللَّهِ مُصَدِّقٌ لِّمَا مَعَهُمْ نَبَذَ فَرِيقٌ مِّنَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ كِتَٰبَ ٱللَّهِ وَرَآءَ ظُهُورِهِمْ كَأَنَّهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿١٠١﴾ وَٱتَّبَعُوا۟ مَا تَتْلُوا۟ ٱلشَّيَٰطِينُ عَلَىٰ مُلْكِ سُلَيْمَٰنَ ۖ وَمَا كَفَرَ سُلَيْمَٰنُ وَلَٰكِنَّ ٱلشَّيَٰطِينَ كَفَرُوا۟ يُعَلِّمُونَ ٱلنَّاسَ ٱلسِّحْرَ وَمَآ أُنزِلَ عَلَى ٱلْمَلَكَيْنِ بِبَابِلَ هَٰرُوتَ وَمَٰرُوتَ ۚ وَمَا يُعَلِّمَانِ مِنْ أَحَدٍ حَتَّىٰ يَقُولَآ إِنَّمَا نَحْنُ فِتْنَةٌ فَلَا تَكْفُرْ ۖ فَيَتَعَلَّمُونَ مِنْهُمَا مَا يُفَرِّقُونَ بِهِۦ بَيْنَ ٱلْمَرْءِ وَزَوْجِهِۦ ۚ وَمَا هُم بِضَآرِّينَ بِهِۦ مِنْ أَحَدٍ إِلَّا بِإِذْنِ ٱللَّهِ ۚ وَيَتَعَلَّمُونَ مَا يَضُرُّهُمْ وَلَا يَنفَعُهُمْ ۚ وَلَقَدْ عَلِمُوا۟ لَمَنِ ٱشْتَرَىٰهُ مَا لَهُۥ فِى ٱلْءَاخِرَةِ مِنْ خَلَٰقٍ ۚ وَلَبِئْسَ مَا شَرَوْا۟ بِهِۦٓ أَنفُسَهُمْ ۚ لَوْ كَانُوا۟ يَعْلَمُونَ ﴿١٠٢﴾ وَلَوْ أَنَّهُمْ ءَامَنُوا۟ وَٱتَّقَوْا۟ لَمَثُوبَةٌ مِّنْ عِندِ ٱللَّهِ خَيْرٌ ۖ لَّوْ كَانُوا۟ يَعْلَمُونَ ﴿١٠٣﴾﴾.

## مانای وشە بە وشەی ئایەتەکان

((ئایا هەرکات پەیمانێکیان (لێوەرگیرا) کۆمەڵێکیان فڕێیاندا، بەڵکو زۆربەیان بڕوا ناهێنن ﴿١٠٠﴾ وە کاتێك پێغەمبەرێکیان لە خواوە بۆهات، کە بەڕاست دانەری ئەوەیە کە پێیانە، هەندێك لەوانەی کتێبیان دراوەتێ، کتێبی خوایان فڕێدایە پاش پشتیان وەك بڵێی نەزانن ﴿١٠١﴾ وە کەوتنە شوێن ئەوەی کە شەیتانەکان لەسەردەمی سولەیماندا دەیانخوێندەوە، وە سولەیمان ﷺ بێبڕوا نەبوو، بەڵکو شەیتانەکان بێبڕوا بوون کە خەڵکیان فێری جادوو، وە فێری ئەوە دەکرد کە بۆسەر دوو فریشتەکان لە بابل، کە هارووتو مارووتن دابەزی، وە کەسیان فێر نەدەکرد تا نەیانگووتبا: ئێمە بۆ تاقیکردنەوەین، جا بێبڕوا مەبە (بە هۆی جادووەوە)، ئیدی ئەوەیان لێفێردەبوون کە مێردو ژنەکەیان لەیەك جیادەکردەوە، وە بێگومان بەبێ ویستی خوا جادووگەران ناتوانن زیان بە هیچ کەس بگەیەنن، وە شتێکیان لێ فێردەبوون کە زیانی لێدەدان، وە سوودی پێ نەدەگەیاندن، وە بەدڵنیاییەوە دەیانزانی کە هەرکەسێك جادوو بکڕێ، لە دوارۆژدا بێبەشە، وە ئەگەر زانیبایان (دڵنیا دەبوون کە) ئەوە خراپترین شتە کە خۆیانی پێ بفرۆشن ﴿١٠٢﴾ وە ئەگەر ئەوان بڕوایان هەبووایەو پارێزیان کردبایە (کارێکیان دەکرد کە پاداشتی خوای تێدابێ) وە پاداشتێك لەلایەن خواوە لە هەموو شتێك چاکترە ئەگەر بزانن﴿١٠٣﴾ )).

## شیکردنەوەی هەندێك لە وشەکان

(نَبَذَهُ): (النَّبْذُ: إلقَاءُ الشَّيءِ وَطَرْحُهُ لِقِلَّةِ الإعتِداد بِهِ)، (نَبذْ) بریتیە لە فڕێدانی شتێكو تووڕدانی بەهۆی کەم گرنگیی پێدانیو بەبێ بایەخ تەماشاکردنییەوە.

(تَتْلُوا ): (تَلاهُ: تَبِعَهُ مُتَابَعَة لَيْسَ بَيْنَهَا مَا لَيْسَ مِنْهَا وذَلِكَ يَكُونُ تَارَةً بِالجِسْمِ وتَارَةً بالإقتِدَاءَ فِي الحُكْمِ ومَصْدَرُهُ: تُلُوٌّ وتِلْوُ، وتَارَةً بِالقِرَاءة

وتَدَبُّر المَعنَى ومَصدَرُهُ تِلاوَة) واتە: (تَلاهُ) یانی: شوێنی کەوت، جا ئەو شوێنکەوتنە شوێنکەوتنێکی یەك لەدوای یەکە کە هیچ شتی نەکەوێتە نێوانیِ، وە جاری وایە شوێنکەوتنی چەند جیسمێکە بەدوای یەکداو، جاری وایە شوێنکەوتنی بڕیارە کە چاوگەکەی (تُلُوّ) و (تِلْوٌ)ە، وە جاری وایە مەبەست پێی خوێندنەوەو لێوردبوونەوەی واتایە، کە چاوگەکەی (تِلاوَة).

(عَلَىٰ مُلۡكِ سُلَيۡمَـٰنَ ): واتە لە سەردەمی حوکمڕانێتی سولەیمان پێغەمبەردا ﷺ کە هەم پێغەمبەر بووەو هەم پادشاش بووە.

(بِبَابِلَ ): شارێکە، ئەو شارە ناودارەیە لە عێراق، کە ئێستاش هەر بەو ناوەوە ماوە.

(فِتۡنَةٌ ): تاقیکردنەوە، (أصْلُ الفَتْنِ: إدْخَالُ الذَّهَبِ النَّار لِتَظهَر جَوْدَتُهُ مِنْ رَدَاءَتِهِ)، واتە: ئەسڵی وشەی (فِتنَة) لە (فَتْن)ەوە هاتوە، (فَتْن)یش ئەوەیە زێڕ بخەیە نێو ئاگرەوە، بۆ ئەوەی چاكو خراپی لەیەك جیابێتەوە، وەك خوای کاربەجێ بە مووسای فەرمووە: ﴿ ...وَفَتَنَّـٰكَ فُتُونًا ...﴿٤٠﴾ ﴾ طه، واتە: تۆمان تاقیکردەوە بە چەند تاقیکردنەوەیەك، تاکو خڵتەی پێوە نەهێڵێ.

(خَلَـٰقٍ ): (الخَلاَق: مَا اكتَسَبَهُ الإنسَان مِنَ الفَضِيلَةِ بِخُلُقِهِ) واتە: (خَلاق) ئەو خەسڵەتە جوانەیە کە مرۆڤ بە ڕەفتاری خۆی وەدەستی دێنێ، وە لێرەدا (خلاق) یانی (نصیب): بەش.

(شَرَوۡاْ بِهِۦٓ ): (الشِّرَاءُ والبَيعِ يَتَلاَزمَانِ، وَشَرَيْتُ بِمَعْنى بِعْتُ أكثَر، وابتَعْتُ بِمَعْنَى اشتَرَيْتُ أكثَر)، واتە: (شِراء وبَيع) پێکەوە پەیوەستنو بەزۆریی (شَرَيْتُ) بەمانای (فرۆشتم) دێ، وە (ابْتَعْتُ) بەمانای (کڕیم) دێ.

(لَمَثُوبَةٌ ): (ثَوَاب) لە ئەسڵدا لە (ثَابَ) (يَثُوب)ەوە هاتوە، واتە: (رَجَعَ) (يَرْجِعُ) کە مەبەست پێی ئەو پاداشتە چاکەیە، کە بەهۆی کردەوەی چاکەوە بۆ ئینسان دەگەڕێتەوە.

## هۆی هاتنـه خـوارەوەی ئایـەتەكـان

دەربارەی هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو ئایەتەی، كە دەفەرموێ: ﴿ وَٱتَّبَعُواْ مَا تَتْلُواْ ٱلشَّيَـٰطِينُ عَلَىٰ مُلْكِ سُلَيْمَـٰنَ ... ﴾، تەفسیرەكان زۆر شتیان باسكردوە، كە هەمووی لە ئیسرائیلیاتەوە وەرگیراوە، یەكێكیان ئەم گێڕراوەیە، كە بەیهەقی لە (سنن)ی خۆیدا هێناویەتی، وە حاكمیش بە صەحیحی داناوە[1] لە عەبدوڵڵای كوڕی عومەرەوە، خوا لێیان ڕازی بێ، وە خاوەنی تەفسیری (فتح القدیر) لە بەرگی (١) لاپەڕە (١٦٧)دا هێناویەتیو، وەك گوتم لە ئیسرائیلیاتەوە هاتوەو من بۆیە بۆتان دێنم، تاكو ئەگەر كەوتە بەرچاوتان فریوی پێ نەخۆن، كە ئەمە دەقەكەیەتی: {(أَشرَفَت المَلائِكَة عَلَى الدُّنيا فرَأت بَني آدَمَ يَعصُونَ، فقَالَت: يَارَبّ مَا أجهَل هَؤلاَء مَا أقلَّ معرفة هؤلاءِ بِعَظَمَتِك، فقَالَ الله: لَوْ كُنْتُم في محلاّتِهم لعصيمتُوني، قَالَتْ: كَيْفَ يَكُونُ هَذَا وَنَحْنُ نُسَبّحُ بِحَمْدِكَ وَنُقَدِّسُ لَكَ؟ قَالَ: فاختَارُوا مِنْكُم مَلَكَين، فَاختَارُوا هَارُوتَ ومَارُوت، ثُمَّ أُهْبِطَا إلى الأرض ورُكِّبَتْ فِيهِمَا شَهَوَاتُ بَني آدَم ومُثِّلَتْ لَهُمَا امرَأةٌ فَمَا عُصِمَا حَتَّى وَاقَعَا المَعْصِيَة، فقَالَ الله: اختَارا عَذَابَ الدُّنيا أو عَذَابَ الآخِرَة، فَنَظَر أحَدُهما لِصاحِبِهِ قَالَ ماتقولُ؟ قَالَ أقُولُ إنَّ عَذَابَ الدُّنيَا، يَنقَطِع وإنَّ العَذَابَ الآخِرَة لايَنقَطِع، فاختَارَا عَذَابَ الدُّنيا فَهُمَا اللّذان ذَكَرَ الله في كِتَابِهِ: ﴿ وَمَآ أُنزِلَ عَلَى ٱلْمَلَكَيْنِ بِبَابِلَ هَـٰرُوتَ وَمَـٰرُوتَ ﴾)}، واتە: مەلائیكەتەكان تەماشای دنیایان كرد ئادەمیزادیان بینی گوناهان دەكەن، گوتیان: ئەی پەروەردگارمان ! ئەوانە چەندە نەزانن، ئەوانە چەندە بێئاگان لە گەورەیی تۆ ! چۆن دەبێ سەرپێچیی لە فەرمانی تۆ بكەن؟! خوا فەرمووی: ئەگەر

---

١) بەڵام مەرج نیە هەر گێڕانەوەیەك لەرووی سەنەدەوە پسپۆڕانی ئەو بوارە بەڕاست (صحیح)یان دانا، ڕاست بێ، بەڵكو وێڕای ڕووی (سند)و (روایة)ی، دەبێ (متن)و (درایة)یشەوە بێ گرێوگۆڵ بێ، ئەوجار بەڕاست دادەنرێ.

ئێوەش لە شوێنی ئەوان بن گوناهـان دەکەن، گوتیـان: جا چـۆن ئێمـە گوناهـان دەکـەین، کـە هەمیـشـە تـۆ بـەپاك دەگـرین‌و ستایـشـت دەکـەین، وە تـۆ دوور دەخەینەوە لـەوە کـە شایـستەی تـۆ نیـە؟ خـوا فـەرمووی: باشـە دوو فریـشتان لـە بەینـی خۆتانـدا هەڵبژێرن (دایانبەزێنمە سەر زەوی داخۆ بزانم چۆن دەردەچـن؟) ئـەوانیش هـارووت‌و مارووتیـان هەڵبـژاردن‌و دابەزێنرانـە سـەر زەوی، وە ئـەو ئارەزووانەی کە لە ئادەمیزاددا هەن، تێیانـدا دانران، (واتە: وەك ئینسانیان لێکرا)، وە ئـافرەتێکی جوانیـان پـێ نیـشانـدرا، ئیـدی خۆیـان پـێ ڕانەگیـرا هەردووکـیان تووشی گوناح بوون لەگەڵی، ئنجا خـوا ﷻ پێـی فـەرموون: هەڵبـژێرن سـزای دنیـا، یاخود هی دواڕۆژ، یەکێکیان تەماشـای ئەویدیکەی کرد، گوتی: دەڵێی چی؟ گوتـی: دەڵێم: سزای دنیا هەرچۆن بێت دەبڕێتـەوە، بەڵام سـزای دواڕۆژ نابڕێتـەوە، ئیـدی سزای دنیـایان هەڵبژارد، جا ئەم ئایەتە کە دەفـەرموێ: ﴿ وَمَآ أُنزِلَ عَلَى ٱلْمَلَكَيْنِ بِبَابِلَ هَٰرُوتَ وَمَٰرُوتَ ﴾، ئەوە لەبارەی ئەو دوو فریشتەوەیە.

هەرچـەندە وەك گوتمـان: زانایـان هەنـدێکیان گوتوویانـە: کـە ئـەوە فـەرموودەی پێغەمبـەرە ﷺ، بـەڵام بـەدڵنیایی یـەوە ئـەوە فەرمایـشتی پێغەمبـەر ﷺ نیـە، بەڵـکـو هـاوەڵان ئەگـەر وەریـشیان گرتبـێ، وەك عەبـدوڵڵای کـوڕی عـەبباس‌و عەبدوڵڵای کوڕی عومەر خوا لێیـان ڕازی بـێ، لـە زانایـانی جوولەکـە وەریـانگرتوە، کـە دەچـێتەوە سـەر ئیـسرائیلیات‌و کـتێبەکانی جوولەکـەکان، وە لەڕاسـتیدا ئـەو بەسەرهاتە شتی وای تێدایە، کە لەگەڵ قورئـاندا ناگونجێ‌و تێکدەگیـرێ، بۆیە ئێمە ناچارین ڕەتیبکەینەوەو دواییش زیاتر قسـەی لەبارەوە دەکەین.

## مانـای گـشـتی ئایـەتەکـان

لەبارەی چۆنیەتی پەیوەستبوونی ئەم ئایەتانە بـە ئایەتـەکانی پـێش خۆیانـەوە، دەڵـێم، وەك مـن تێیدەگـەم‌و لەبـەر تیـشکی تێگەیـشتنی توێژەروانـداو بـە وردبوونـەوەی خۆشـم، خـوا ﷻ هـەر لەسـەر باسـی جوولەکـەکان بەردەوامـەو دەفـەرموێ: ﴿ أَوَكُلَّمَا عَٰهَدُوا۟ عَهْدًا نَّبَذَهُۥ فَرِيقٌ مِّنْهُم ۚ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ ﴾،

ئەوە چییە هەرکاتێ پەیمانێکیان بەست، هەندێکیان پەیمانەکە دەشکێنن! بەڵکو زۆربەیان ئیمان ناهێنن، تەماشا بکەن خوا ﷻ خوای ڕاستبێژو دادگەرو کاربەجێ، نەیفەرمووە: هیچیان ئیمان ناهێنن، بەڵکو فەرموویەتی: ﴿ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ ﴾، وە لە شوێنی دیکەدا دەفەرموێ: ﴿ فَرِيقٌ مِّنْهُم ﴾ کۆمەڵێکیان، جا ئەوە ئێمە دەبێ لێیەوە فێری عەدلو ئینصاف بینو نەچین حوکمی گشتی بەسەر خەڵکیدا بدەین، لەنێو هەموو خەڵکیدا چاكو خراپ هەیە، بۆیە لێرە دەفەرموێ: بەڵکوو جولەکەکان زۆربەیان ئیمان ناهێننو زۆر بێ پەیمانن، بەڵام لەوبارەشەوە دیسان دەفەرموێ: ﴿ فَرِيقٌ مِّنْهُم ﴾، کۆمەڵێکیان پەیمان دەشکێنن، نافەرموێ: هەموویان، ئنجا باسی هەڵوێستیان لە بەرانبەر پێغەمبەری کۆتاییدا دەکات: ﴿ وَلَمَّا جَآءَهُمْ رَسُولٌ مِّنْ عِندِ ٱللَّهِ مُصَدِّقٌ لِّمَا مَعَهُمْ ﴾، وە هەرکاتێك پێغەمبەرێکیان لەلایەن خواوە (بۆ هات کە مەبەست پێی موحەممەدە ﷺ) کە ئەوەی بەوانیشە بەڕاستی دەزانێ، ئەم تەعبیرە: ﴿ مُصَدِّقٌ لِّمَا مَعَهُمْ ﴾، بۆیە خوا ﷻ هەمیشە دووبارەی دەکاتەوە بە بۆچوونی من:

**یەکەم:** بۆ ئەوەی بزانرێ کە موحەممەد ﷺ یەکێکە لە پێغەمبەرانی خواو هەموو پێغەمبەرانی پێش خۆی بەڕاست دەزانێ، بۆیە هەر کۆمەڵێك خۆیان بە شوێنکەوتووی هەر پێغەمبەرێك دەزانن، دەبێ دەمارگیرییان بۆ ئەو پێغەمبەرە وایان لێنەکات، کە بڕوا بە موحەممەد نەهێنن، چونکە موحەممەد ﷺ ئەو پێغەمبەرەی ئەوانیش بەڕاست دەزانێو کتێبەکانی ئەوانیش ئەسڵەکەیان بەڕاست دەزانێ.

**دووەم:** بۆ ئەوەی بزانرێ کە پێغەمبەری کۆتایی ﷺ شتێکی جیا لە پێغەمبەرانی دیکەی نەهێناوە، وە پێغەمبەران هەموویان ڕێبواری یەك ڕێگابوونو، یەك بەرنامەیان پێبووەو، هەموویان یەکتریان بەڕاست زانیوە، وەنەبێ پێغەمبەرێك شتێکی هێنابێ جیا لەوانی دیکە! بەڵێ لە شتی بچووکدا کە تایبەت بوون بە ژینگەو بە واقیعو هەلومەرجی

کۆمەڵگەوە، یان عورفو باوی ئەو خەڵکەوە، کە لە سەردەمی وان دابوون، جیاوازیی هەبووە لەنێوان بەرنامەی پێغەمبەراندا (علیهم الصلاة والسلام) بەڵام لە هێڵە گشتیەکاندا، هەموو پێغەمبەران یەك بەرنامەیان پێبووە، وەك لە شوێنێکی دیکە دەفەرموێ: ﴿شَرَعَ لَكُم مِّنَ ٱلدِّينِ مَا وَصَّىٰ بِهِۦ نُوحًا وَٱلَّذِيٓ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ وَمَا وَصَّيْنَا بِهِۦٓ إِبْرَٰهِيمَ وَمُوسَىٰ وَعِيسَىٰٓ ۖ أَنْ أَقِيمُوا۟ ٱلدِّينَ وَلَا تَتَفَرَّقُوا۟ فِيهِ ...﴿١٣﴾﴾ الشوري، بەڵێ پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) هەموو یەك دینیان هێناوە، ئەویش ئیسلامە، بۆیە زاراوەی دینە ئاسمانییەکان (الأديان السماوية) هەڵەیە، بەڵکو دەبێ بگوترێ شەریعەتە ئاسمانییەکان، بەرنامە ئاسمانییەکان، ئەگەرنا دین یەك دینە، وەك خوای تاكو پاك دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلدِّينَ عِندَ ٱللَّهِ ٱلْإِسْلَٰمُ ...﴿١٩﴾﴾ آل عمران، واتە: ئایین لەلای خوا بەس ئیسلامە... بەڵام ڕێبازو بەرنامەکان لە تەفصیلیاندا جۆراو جۆرن، بۆیە دەفەرموێ: ﴿...لِكُلٍّ جَعَلْنَا مِنكُمْ شِرْعَةً وَمِنْهَاجًا ...﴿٤٨﴾﴾ المائدة، واتە: بۆ هەرکامێکتان ڕێبازو بەرنامەیەکی تایبەتمان داناوە، جا دەفەرموێ: کاتێ ئەو پێغەمبەرەیان ﷺ بۆ هات: ﴿نَبَذَ فَرِيقٌ مِّنَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ كِتَٰبَ ٱللَّهِ وَرَآءَ ظُهُورِهِمْ﴾، کۆمەڵێك لەوانەی کتێبیان پێدراوە، کتێبی خوایان فڕێدایە پاش پشتیان، واتە: ئیهمالیان کرد، لێرەدا زانایانی ڕەوانبێژیی دەڵێن: خۆ ئەوە نەبووە ئاوا کتێبەکە فڕێدەنە پاش پشتیان! بەڵکو یانی بەشێوەیەك مامەڵەیان لەگەڵ کتێبی خوادا کرد (کە تەوراتەو باسی موحەممەدی کردووە نیشانەکانی موحەممەدی تێدان و دەڵێ: دەبێ ئیمان بە پێغەمبەری کۆتایی بێنن) ئەوانە بەشێوەیەك مامەڵەیان لەگەڵ تەوراتدا کردوە، وەك کەسێك شتێك فڕێداتە پاش پشتی خۆی ﴿كَأَنَّهُمْ لَا يَعْلَمُونَ﴾، وەك هەر هیچ عیلمیان نەبێت، بەوەی کە موحەممەد پێغەمبەری خوایە، ئاوا مامەڵەیان لەگەڵ موحەممەددا کردو ئیمانیان پێ نەهێنا ! ئنجا دیارە

هەرکەسێ بەدوای کتێبی خوا نەکەوت، دەبێ شتێکی دیکە بدۆزێتەوە بەدوای بکەوێتو ئەوەی بەدوای هەق نەکەوێ، دەکەوێتە دوای باطیلْ، ئەوەی خوای نەپەرست شەیتان دەپەرستێ، طاغووت دەپەرستێ، ئەوەی بەرێی هەقدا نەڕۆیی، بەرێی باطیلْدا ملدەنێ، بۆیە یەکسەر دەفەرموێ: ﴿ وَاتَّبَعُواْ مَا تَتْلُواْ الشَّيَاطِينُ عَلَى مُلْكِ سُلَيْمَانَ ﴾، وە بەدوای ئەوە کەوتن کە شەیتانەکان لە ڕۆژگاری حوکمڕانێتی سولەیماندا دەیانخوێندەوە، شەیتانەکان جادوویان بڵاودەکردەوە، لەسەردەمی سولەیمانداو جوولەکەکان وازیان لە کتێبی خوا هێناو، سەرگەرمی جادووگەریی بوون، ئنجا بۆ ئەوەی وا گومان نەبرێ، کە سولەیمان ڕەواجی بە جادووگەریی داوە، دەفەرموێ: ﴿ وَمَا كَفَرَ سُلَيْمَانُ ﴾، سولەیمانیش قەت کوفری نەکردوەو بێبڕوا نەبووە، (جوولەکەکان دەیانگوت: ئەوە چییە موحەممەد باسی سولەیمان دەکا، سولەیمان بەس جادووگەرێك بووە لە جادووگەرەکان خۆ پێغەمبەر نەبووە !!) بۆیە خوای پەروەردگار دەفەرموێ: سولەیمان هەرگیز بێبڕوا نەبووەو کافر نەبووە، واتە: خەریکی جادووگەریی نەبووە! ﴿ وَلَكِنَّ الشَّيَاطِينَ كَفَرُواْ ﴾، بەڵکو شەیتانەکان کافرو بێبڕوا بوون، جا شەیتان دەگونجێ جندو مرۆڤی مەبەست بێ، چونکە: شەیتان لە (شَطَنَ)ەوە هاتوە، واتە: دوورکەوتەوە (بَعُدَ)، بۆیە هەرکەسێك خەڵکی لە خوا دووربخاتەوە شەیتانە، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ ... شَيَاطِينَ الإِنسِ وَالْجِنِّ يُوحِي بَعْضُهُمْ إِلَى بَعْضٍ زُخْرُفَ الْقَوْلِ غُرُوراً ... ﴿١١٢﴾ ﴾الأنعام، واتە: شەیتانەکان مرۆڤ و جند، هەندێکیان قسەی ڕازاوەو فریودەر فێری هەندێکیان دەکەن، جا ئایا شەیتانەکان چییان دەکرد؟ ﴿ يُعَلِّمُونَ النَّاسَ السِّحْرَ ﴾، جادوویان فێری خەڵکی دەکرد ﴿ وَمَا أُنزِلَ عَلَى الْمَلَكَيْنِ بِبَابِلَ هَارُوتَ وَمَارُوتَ ﴾، وە ئەو جادووەیان فێری خەڵکی دەکرد، کە دابەزیبووە بۆ سەر دوو فریشتەکان لە بابل: هارووتو مارووت،

﴿ وَمَا يُعَلِّمَانِ مِنْ أَحَدٍ حَتَّىٰ يَقُولَآ إِنَّمَا نَحْنُ فِتْنَةٌ فَلَا تَكْفُرْ ﴾، لێرەدا خوای پەروەردگار وەڵامی پرسیارێك دەداتەوە، كە لە مێشكی هەمووماندا سەرهەڵدەدات:

باشە لەبەرچی فریشتەی پاك جادوو فێری خەڵكی دەكات، بۆچی؟ خوا دوو مەلائیكەتان دادەبەزێنێ جادوو فێری خەڵكی بكەن؟! دەفەرموێ: وە هیچ كەسیان فێری جادوو نەدەكرد، هەتا پێیان نەگوتبا: ئێمە بۆ تاقیكردنەوە دانراوین، جا خۆت كافر مەكە! واتە: فێری جادوو مەبە ئەگەر فێری ببی، وە بەكاری بهێنی كافر دەبی، كەواتە خۆت كافر مەكە! حیكمەتی ئەوەش كە خوا ئەو دوو فریشتەیەی ناردوون، ئەوە بووە كە لە سەردەمی سولەیماندا جادوو زۆر بڵاوبووبۆوەو بەتایبەتی لەدوای كۆچی دوایی سولەیمان (علیە الصلاة والسلام)، جوولەكەكان بڵاویان كردەوەو گوتیان: ئەو موعجیزانەی كە سولەیمان كردوونی، ئەوە هەمووی جادوویە! بۆیە خوا ﷻ دوو فریشتەی ناردنە خوارێ، تاكو جادوو فێری خەڵك بكەن. بۆ ئەوەی خەڵك بزانن جادوو چییە؟ وە مەودایەكەی چەندەو تا كوێیە؟ وە جیابێتەوە لە موعجیزەی پێغەمبەران، لەنێویاندا پێغەمبەر سولەیمان ﵇ كە موعجیزەی گەورە گەورەی هەبوو ون، بۆ ئەوەی موعجیزەی پێغەمبەران و جادووی جادووگەران، تێكەڵ نەبن. ﴿ فَيَتَعَلَّمُونَ مِنْهُمَا مَا يُفَرِّقُونَ بِهِۦ بَيْنَ ٱلْمَرْءِ وَزَوْجِهِۦ ﴾، جا لێیان فێردەبوون (لەو دوو فریشتانە) جادوویەكی وا، كە پیاوو هاوسەرەكەیان پێ لێك جیادەكردەوە، (ئەمە ئەوە دەگەیەنێ، كە جادوو دەتوانێ ژن و مێرد لەیەك بترازێنێ) ﴿ وَمَا هُم بِضَآرِّينَ بِهِۦ مِنْ أَحَدٍ إِلَّا بِإِذْنِ ٱللَّهِ ﴾، وە ئەوانە (كە جادوو فێردەبوون، چ لە شەیتانەكان، چ لەو فریشتانەوە كە خوا بۆ تاقیكردنەوە دایناببوون) نەیاندەتوانی زیان لە هیچ كەسێ بدەن، مەگەر بە مۆڵەتی خواو، مەگەر خوا ویستبای ﴿ وَيَتَعَلَّمُونَ مَا يَضُرُّهُمْ وَلَا يَنفَعُهُمْ ﴾، وە بەتەئكید ئەوانەی كە جادوو فێردەبوون،

شتێك فێردەبوون، كە هەر زەرەری لێدەدان‌و هیچ سوودی پێ نەدەگەیاندن، واتە: جادوو هەر زەرەر لە ئینسان دەدات‌و سوودی پێ ناگەیەنێ، ﴿ وَلَقَدْ عَلِمُواْ لَمَنِ ٱشْتَرَىٰهُ مَا لَهُۥ فِى ٱلْـَٔاخِرَةِ مِنْ خَلَٰقٍ ۚ وَلَبِئْسَ مَا شَرَوْاْ بِهِۦٓ أَنفُسَهُمْ ۚ لَوْ كَانُواْ يَعْلَمُونَ ﴾، وە بێگومان زانییان، كە هەركەسێك بیكڕێ (واتە: جادوو) لە دوارۆژدا هیچ پشك‌و بەشێكی نیە، وە خراپترین شت جادوو بوو، كە خۆیانیان پێ دەفرۆشت، ئەگەر زانیبایان، (واتە: ئەگەر زانیبایان خۆیان نەدەفرۆشت‌و لە بەرانبەردا جادوویان نەدەكڕی) وە لە كۆتاییدا دەفەرموێ: ﴿ وَلَوْ أَنَّهُمْ ءَامَنُواْ وَٱتَّقَوْاْ ﴾، وە ئەگەر ئەوانە ئیمانیان هێنابا‌و پارێزیان كردبا ﴿ لَمَثُوبَةٌ مِّنْ عِندِ ٱللَّهِ خَيْرٌ ۖ لَّوْ كَانُواْ يَعْلَمُونَ ﴾، پاداشتیان پێ دەبرا، وە بێگومان پاداشتی لای خواش چاكترە لە هەموو شتێك ئەگەر بزانن.

## چەند مەسەلەیەكی گرنگ

**مەسەلەی یەكەم:** خوا ﷻ دوای ئەوەی باسی ئەوە دەكات، كە جوولەكەكان كتێبی خوایان هەڵدایە پاش پشتیان: ﴿ نَبَذَ فَرِيقٌ مِّنَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلْكِتَٰبَ كِتَٰبَ ٱللَّهِ وَرَآءَ ظُهُورِهِمْ ﴾، یەكسەر دوای ئەوە دەفەرموێ چی؟ دەفەرموێ: ﴿ وَٱتَّبَعُواْ مَا تَتْلُواْ ٱلشَّيَٰطِينُ ﴾، بەدوای ئەوە كەوتن كە شەیتانەكان دەیانخوێندەوە، كەواتە: هەمیشە بەدیلی شوێنكەوتنی كتێبی خوا، بریتیە لە شوێنكەوتنی شەیتانەكان، شەیتانی ئادەمزادو شەیتانی جند، وە هەمیشە شوێنگرەوەی رێی هەق، گرتنی رێی ناهەقەو هیچ چارنیە، وە شوێنگرەوەی بەندایەتیی بۆ خوا، بریتیە لە كۆیلایەتیی كردن بۆ طاغووتەكان، بۆ بت‌و صەنەم، بۆ هەواو ئارەزوو، ... هتد.

**مەسەلەی دووەم:** ئەوەش لەم ئایەتانە وەردەگیرێ، کە جوولەکەکان زۆر سەرگەرمی جادوو بوونو ئەوەش حەقیقەتێکی مێژوویی یەو، ئێستاش لەگەڵدابێ جوولەکەکان جادووگەری زۆر بێڕەزایان هەیەو، زۆر گرنگیی بە جادوو دەدەن، لە حاڵێکیشدا کە لە (پەیمانی کۆن)[1] و لە تەوڕاتدا باسکراوە، کە جادوو شتێکی زۆر خراپەو سزای زۆرخراپی هەیە، بەڵام خۆ ئەوانە بە تەوڕاتەوە پابەندنەبوونو پێوەی پابەندنین!

**مەسەلەی سێیەم:** ئەوەش وەردەگیرێ کە شەیتانەکان سەرچاوەی (جادوو)ن واتە: شەیتانی جند، جا ئێمە لە دەرسی داهاتوودا ڕوونی دەکەینەوە، کە جادوو بەتایبەتی ئەوەی کە زەرەر دەدات، بەزۆریی بە هۆی شەیتانەکانەوەیە، بۆیەش خوا دەفەرموێ: ﴿ وَٱتَّبَعُواْ مَا تَتْلُواْ ٱلشَّيَـٰطِينُ ﴾.

**مەسەلەی چوارەم:** ئەم ئایەتانە زۆر بەڕوونو ڕاشکاویی ئەوە دەگەیەنن، کە جادووکردنو جادوو فێری خەڵك کردن کوفرەو، ئینسانی پێ کافر دەبێ، بۆچی؟ جارێ خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَمَا كَفَرَ سُلَيْمَـٰنُ ﴾، لەجیاتی بفەرمووێ: (وما سحر سليمان) یان (وما عَلَّم سليمانُ السحر أحد) دەفەرموێ: ﴿ وَمَا كَفَرَ سُلَيْمَـٰنُ ﴾، تاکو بزانین کە هەرکەسێك جادوو فێری خەڵك بکاتو، وە بۆ جادوو هانیانبداو بانگیان بکات، ئەوە مانای وایە کوفری کردوە، دیسان هەر لە ئایەتەکەدا دەفەرموێ: ﴿ وَلَـٰكِنَّ ٱلشَّيَـٰطِينَ كَفَرُواْ يُعَلِّمُونَ ٱلنَّاسَ ٱلسِّحْرَ ﴾، بەڵکو شەیتانەکان کافر بوون، کە خەڵکیان فێری جادوو دەکرد، کەواتە: هەرکەسێك خەڵك فێری جادوو بکات، وە خەڵکی بۆ

---

١) بڕوانە: (التفسير التطبيقي للكتاب - المقدس - ) العهد القديم، سفر الملوك الثاني، الإصحاح: ٢١، ص: (٨٣٥). کە لە شەرحەکەیدا هاتوە: {٢١: ٦ كان منسى ملكاً شريراً وأنماط الله بخطيئته، فكان من بين خطاياه، الممرسات الوثنية من السحر الأسود والعرافه..}، واتە: مونەسسا پادشایەکی خراپەکار بوو، وە بە گوناهەکەی خوای تووڕەکردبوو، وە لەنێو گوناهەکانیدا کردەوە بتپەرستییەکان بوون، لە جادووی ڕەشو فالگرتنەوە.

هانبدات، پێی کافر دەبێ. دیسان کە دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا نَحْنُ فِتْنَةٌ فَلَا تَكْفُرْ﴾، هاڕووتو ماڕووت کە خەڵکیان فێری جادوو دەکرد، {بۆ ئەوەی کە بزانن عیلمی سیحر چۆنە؟ ئەگەرنا بۆ ئەوەیان نەبووە کە خەڵك ببێتە جادووگەر، بەڵکو مەبەستیان ئەوە بوو کە خەڵك بزانن عیلمی سیحر چییە؟ تاکو لەگەڵ موعجیزەی پێغەمبەران تێکەڵ نەبێو سەریان لێ نەشێوێو پێغەمبەران بە جادووگەر نەزانن، وەك ئێستاش لەگەڵدابێ لە (پەیمانی کۆن)[1]دا دەڵێ: سولەیمان بتپەرست بووە! جا بۆ ئەوەی کە خەڵك تووشی ئەو چەواشەکارییە نەبێتو موعجیزەی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) بە جادووی جادووگەران حاڵی نەبێ، بۆیە خوا هاڕووتو ماڕووتی ناردنە خوارێ خەڵك فێری عیلمی سیحر بکەن، جا لێرە دەفەرموێ:} دەیانگوت: ئێمە بۆ تاقیکردنەوەینو خۆت کافرمەکە، واتە: قەیناکا سیحر شارەزابی، بەڵام کاری پێنەکەیو فێری خەڵکی نەکەیو بڵاوی نەکەیەوە!

کەواتە: ئەسڵی فێربوونەکە بۆخۆی کوفر نیە، بە مەرجێك لە خودی فێربوونەکەدا بۆخۆی کوفری تێدانەبێت، واتە: کەسێك ئەگەر کتێبی جادوو بخوێنێتەوە، تاکو بزانێ جادوو چییە؟ ئەوە کوفر نیەو گوناهیش نیە، ئنجا بەڵگەیەکی دی لەسەر ئەوەی کە جادووکردنو سیحر فێری خەڵك کردن کوفرە، ئەوەیە کە دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ عَلِمُوا۟ لَمَنِ ٱشْتَرَىٰهُ مَا لَهُۥ فِى ٱلْـَٔاخِرَةِ مِنْ خَلَـٰقٍ﴾، وە زانییشیان کە هەرکەسێ سیحر بکڕێ، ئەوە لە دواڕۆژ هیچ بەشی نیەن دیارە تەنیا کافرانیش بە ڕەهایی لە دواڕۆژدا بێبەشن.

**مەسەلەی پێنجەم:** ئینسان دروستە شتی خراپ بزانێ، جا جادووبێ، یان هەر شتێکی دیکە، بۆ نموونە: بیروبڕوای بێبڕوایانە، وەك فەلسەفەی مارکسیزم، ماددیی گەریی، لیبڕالیزمو هەر فیکرەیەکی دیکەی خراپو غەڵەت، دروستە

---

١) بڕوانە: (التفسیر التطبیقي للکتاب المقدّس) العهد القدیم، سفر الملوك الأول، الإصحاح: (١١)، ص: (٧٣١، ٧٣٢)، هەروەها لە شوێنێکی دیکەدا دەڵێ: جادووگەریش بووە!

بیزانی، بۆ ئەوەی کە شەڕو خێر بزانیو لە یەکیان جیابکەیتەوە، ئەوەتا خوای پەروەردگار ئەوەندە باسی جوولەکەکانمان بۆ دەکات، بۆ ئەوەی بیانناسین پاشخانی نەفسییو فیکرییان بزانینو مێژوویییان بزانینو غەڵەتو پەڵەتییان بزانین، تاکو لە غەڵەتەکانیان عیبرەت وەربگرینو لە چاکەکانیشیان چاکە فێربین، کەواتە: ئەگەر کەسێك بیەوێ بزانێ سیحر چییە؟! شتێکی ڕەوایە، جگە لە حاڵەتێکی تایبەت، ئەویش ئەوەیە کە وەك گوتم جاری وا هەیە هەندێك فێربوونی سیحر، بۆخۆی کوفرەو دەبێ مومارەسەی هەندێك شت بکرێ، کە لە خودی خۆیدا کوفرە، ئەگەر ئەوە نەبێ، بێگومان خوێندنەوەی کتێبی سیحر خراپ نیە، شاعیرێکیش دەڵێ:

عَرَفْتُ الشّرَ لاَ لِلشّرِ لَكِن لِأَتّقيه

وَمَنْ لَمْ يَعْرِف الشّرَ مِنَ النَّاس يَقَعَ فيهِ

واتە: خراپەو شەڕم بۆیە زانی هەتا خۆمی لێبپارێزم

هەرکەسێ خراپەی نێو خەڵکی نەزانێ تێیدەکەوێ .

**مەسەلەی شەشەم:** جادوو زیان لە خەڵك دەدات، وە حەقیقەتی هەیە، بە بەڵگەی ئەوە کە خوا دەفەرموێ: ﴿ مَا يُفَرِّقُونَ بِهِۦ بَيْنَ ٱلْمَرْءِ وَزَوْجِهِۦ ﴾، وە دوایی دەفەرموێ: ﴿ وَيَتَعَلَّمُونَ مَا يَضُرُّهُمْ وَلَا يَنفَعُهُمْ ﴾، کەواتە: ڕاستە جادوو زەرەرو زیان دەدا، وە ئەم ڕستەیە ئەوەش دەگەیەنێ، کە جادوو هیچ جۆرە خێرو سوودو مەنفەعەتێکی نیە، چونکە دەفەرموێ: ﴿ وَلَا يَنفَعُهُمْ ﴾، هەر بۆیەشە جادووگەران نەدارترین کەسنو هەمیشە ئاتاجنو خەریکی سواڵو سەدەقەن، ئەگەرنا ئەگەر خەڵك بە جادوو دەوڵەمەند بووایە، دەبوو جادووگەران لە هەموو خەڵکی دەوڵەمەندتربان.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی بیستەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

لەم دەرسەماندا لێكۆڵینەوەیەك دەربارەی جادوو دەكەین، وەك لە دەرسی پێشوودا بەڵێنماندا، خوای بە بەزەیی پشتیوان بێت، هەوڵدەدەین لە دە (١٠) خاڵدا باسی جادووو جادووگەران (السِّحْرو السَّحْرَة) بكەین، دیارە لێكۆڵینەوەكەمان لێكۆڵینەوەیەكی پوختو كورتو گوشراو دەبێت، ئەگەرنا لەڕاستیدا چوونە نێو دنیای جادووو جادووگەران بە دەرسێكو دووان كۆتایی پێ نایە، جیهانی جادووو جادووگەران، جیهانێكی ئاڵۆزەو جیهانێكی زۆر بە لقو پۆپە، بەڵام من لێرە هەوڵم داوە ئەوەی كە بە پێویستی دەزانم ئێوەی بەڕێز بیزانن دەربارەی جادوو، وە دەربارەی جادووگەران، پوختو كورتی بكەمەوە: پێش هەموو شتێك پێویستە ئەوە بزانین كە ئینسان وەك چۆن جەستەیەكی بەرهەستە، ڕووحێكی پەنهانیشە، ئنجا وەك چۆن جەستە ئەگەر خزمەت بكریو مەشقی پێبكریو بەهێز بكری، گۆڕانی زۆر بەسەردادی، تەماشا دەكەی دوو ئینسان كە یەكێكیان جەستەكەی خۆی خەم لێخواردوەو مشووری لێخواردوەو ڕایهێناوە، بۆ نموونە: بابایەكی كاراتە، یاخود جومناستیك، لەگەڵ یەكێكی دیكە كە بەو شێوەیە خەمی لە جەستەی خۆی نەخواردوەو مەشقی پێنەكردوە، زۆر لەیەك جیان، ئەو كەسەی كە كاراتە، یان كۆنفۆ دەزانی، یاخود جومناستیكە، تەماشادەكەی هەڵسوكەوتی وادەكات جموجۆڵی وادەكات، زۆر جێی سەرسوڕمانە، جا وەك چۆن جەستە ئەگەر خزمەت بكریو بەهێز بكریو مەشقی پێبكریو ڕابهێنری، دەتوانی حاڵەتی سەرسووڕهێنەر بنوێنیو لەخۆی پێشان بدات، ڕووحیش بەهەمان شێوەو بەڵكو ڕاستتریش، چونكە بێگومان ڕووح توانای زۆر زۆر زیاترە لە جەستە، وە لەڕاستیدا ئینسانەكان ئەوەندەی كە بەهۆی

ڕووحیانەوە لەیەك جیادەبن، قەت بەهۆی جەستەوە لەیەك جیانابن، ئێمە تەماشا دەکەین خەڵك لەڕووی جەستەوە، تواناکانیان لێك نزیکن و زۆر بەرزیی و نزمییان نیە، بەڵام لەڕووی ڕووحەوە، وە لەڕووی هۆش و عەقڵیشەوە کە ئەویش هەر یەکێکە لە ئیشەکانی ڕووح، وە لەڕووی عاتیفەوەو لەڕووی خەیاڵ و ئەندێشەوە، تەماشا دەکەی ئینسانەکان زۆر لەیەك جیان و بە مەسافەیەکی زۆر لەیەك جیادەبنەوە ! گرنگ ئەوەیە ئەو حەقیقەتە بزانرێ کە ڕووح، چ بە باری خێرو چاکەدا خزمەت بکرێ و پەروەردە بکرێ و مەشقی پێبکرێ و ڕابهێنرێ، دەگونجێ شتی سەرسووڕهێنەری لێ پەیدادەبێ، وە چ بە باری شەڕو خراپەشدا، کە دیارە ئینسان بەباری خێرو چاکەدا لە عالەمی مەلائیکە نزیك دەبێتەوەو، بە باری شەڕو خراپەدا لە عالەمی شەیتان نزیك دەبێتەوە، ئەوەش حەقیقەتێکە پێویستە پێش ئەوەی بچینە نێو باسی جادووو جادووگەران بیزانین، بۆیەش پێویستە ئەوە بزانرێ، چونکە هەندێ کەس هەندێ شت دەکات، هیچ پەیوەندیی بە جادووەوە نیە، بەڵکو پەیوەندی بە بەهێزکردنی لایەنی ڕووحییەوە هەیە، چ بە باری خێر، چ بە باری شەڕدا، کە بێگومان ئەوە جیایە لە مەسەلەی جادوو.

## خاڵی یەکەم: مێژووی جادووو جادووگەریی:

جادووو سەرگەرم بوون بە جادووەوەو پەیدابوونی خەڵکی جادووگەر، مێژوویەکی دێرینی هەیە، بەپێی ئەو نووسینانەی کە لەسەر دەرو دیواری کەلاوەکان و شوێنەوارە مێژوویی یەکان هەن، هەتا هەندێك لە مێژوونووسان گوتوویانە: ئینسان بەرلەوەی دینی ڕاست و دروست بزانێ، ئاشنابووە بە جادوو، بەڵام ئەوە وانیەو یەکەمین شتێك کە ئینسان پێی ئاشنا بووە، هیدایەتی خوا بووە، لەڕێی ئەو وەحییەوە کە بە پێغەمبەراندا (علیهم الصلاة والسلام) ناردوویەتی و لە کتێبەکانی خواو بەرنامەکانی خوادا بەرجەستە بووە، پێش هەموو شتێك ئینسان بەوە ئاشنا بووە، بەڵام دوایی کە لایداوەو تووشی لادان (انحراف) بووە، ئنجا بە جادوو ئاشنا بووە، بەڵگەشمان لەڕووی قورئانەوە کە جادووگەریی زانستێکی زۆر کۆنە، ئەوەیە کە خوای زاناو شارەزا لە سوورەتی

(الـذاريات)دا فەرموویـەتی: ﴿ كَذَٰلِكَ مَآ أَتَى ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِم مِّن رَّسُولٍ إِلَّا قَالُواْ سَاحِرٌ أَوْ مَجْنُونٌ ﴿٥٢﴾ ﴾، واتـە: بـە هـەمان شـێوە ئـەوانی پێـشووش هـیچ کامیـان پێغەمبەریـان بۆ نەهات مەگەر گوتیـان: جادووگـەرە یان شێتە، کەواتـە: جـادوو لـە دێرزەمانـەوە لـەنێو بەشـەردا بـاوبووە، بۆیـە نـەیارانی پێغەمبـەران بـەوە تۆمەتبـاریان کردوون، کە ئەو موعجیزانـەی پێـشانیان دەدەن، ئـەوە لـە جـادووەوە سەرچاوە دەگرێ.

## خـاڵی دووەم: ئەو شـوێنانەی بە جادوو بەناوبانـگ بوون لە مێژوودا:

لە پێش هەموویـاندا میسر زۆر ناودار بووە بە جـادوو، وە ئێستاش هێندێ لـە مێژوونووسـان دەڵێـن: ئـەو جەسـتە مۆمیاکراوانـەی کـە لـە مۆزەخانەکانـدا هـەن، {دیـارە ئـەو کاتـە تـەنیا جەسـتەی پادشـاو پاشـازادەو خەڵـکی خـاوەن دەسـتەڵات مۆمیـاکراوە، چـونکە مۆمیـاکردن (تَحْنِـيط) مـەسـرەفێکی زۆری تێـچووە} ئەوانـە دەڵێن: ئێستاش هەندێ لەوانە جـۆرێ لە (طِلِّسـم)و جادوویـان لەسـەر خوێنراوە، کە هەندێك لەو کەسانەی بەشێوەیەکی نارێـك مامەڵەیان لەگەڵ ئـەو جەسـتانەدا کردوە، تووشی زەرەر بوونو زانـایان زۆر شـتیان لەوبارەوە باسـکردوە، وە یەکێکـی دیکە لەو شوێنانە (بابـل) بـووە، کـە خـوای پەنهـانزان باسـیکردوە: ﴿ وَمَآ أُنزِلَ عَلَى ٱلْمَلَكَيْنِ بِبَابِلَ هَٰرُوتَ وَمَٰرُوتَ ﴾، هەروەها وڵاتـی (فارس) زۆر بە جـادوو نـاودار بووە، هەروەها هەر کـام لـە (هینـد) و (یۆنـان) لـەبواری جادووگـەرییدا بـەناوبانـگ بـوون، هـەروەها عـەرەب پـێش ئیـسلام سـیحریان لـەنێودا هـەبووە، وە ئێـستاش لەگەڵـدابێ لـە زۆربـەی وڵاتـانی دنیـادا، لـەنێو زۆربـەی میلـلەتاندا، ئەوانـەی کـە لادەدەن لە شەریعەتو بەرنامەی خواو دینێکی ڕاستو دروستیان لەبەردەست نیە، کـە بێگومـان دینـی ڕاسـتو نەگـۆڕاوی خـوا ئێـستا تـەنیا ئیـسلامە، جادووگـەریی کـەمو زۆر بـاوەو ڕەواجـی هـەیە.

## خاڵی سێیەم: ئایا جادوو (سحر) چییە ؟

کە تەماشای فەرهەنگەکانی زمانم کرد، زانایان هەموویان لەسەر ئەو پێناسەیە بۆ جادوو یەك دەنگن، کە دەڵێ: ((هُوَ كُلُّ مَا خَفِيَ سَبَبُهُ ولَطُفَ وَدَقَّ مَأْخَذُهُ))، واتە: هەر شتێکە هۆیەکەی پەنهان بێ، وە شوێنی وەرگرتنی پەنهان بێ و وردەکاریی تێدابێ، کە هەموو کەس نەتوانێ بیکات، وەك لە فەرمایشتێکدا هاتوو کە پێغەمبەر ﷺ، ڕۆژێك گوێبیستی وتاری کابرایەك دەبێت، وتارێکی ڕێك دەدا لەبارەیەوە دەفەرموێ: {(إِنَّ مِنَ الْبَيَانِ لَسِحْراً) (رَوَاهُ أَحْمَد برقم: (٦٤٦٨)، وَالْبُخَارِيُّ برقم: (٥٧٦٧)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٢٠٢٨)، وَأَبُودَاوُدَ برقم: (٥٠٠٧)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٥٧٩٥)، عَنْ عَبدِالله بْنُ عُمَرَ رضي الله عنه}، واتە: هەندێك قسەکردن جۆرێکە لە جادوو ! هەڵبەتە وەك دوایی باسی دەکەین، جادوو دەبێتە چەند بەشێکەوە، بەشێکیان پێی دەگوترێ: جادووی مەجازیی (السِّحر المَجَازي) کە لێرە پێغەمبەر ﷺ مەبەستی پێ بەشە (مَجَازي)یەکەیەتی، واتە: لەو ڕووەوە کە وتاری باش و قسەی ڕێك، باش دەچێتە دڵی خەڵکەوەو کاری تێدەکات بەشێوەیەکی پەنهان، لەو ڕووەوە وێکچوونی هەیە لەگەڵ جادوو، ئەگەرنا قسەکردن بە موتڵەقیی جادوو نیە، بەڵکو مەبەستی ئەوەیە کە لەڕووی کارتێکردن لە دڵی بیسەردا، شێوەی جادووی هەیە، چونکە جادوو بە شێوەیەکی پەنهان کاری خۆی دەکات.

ئنجا (ابن خَلدُون) لە کتێبە ناودارەکەی خۆیدا کە (المقدمة)یە لە لاپەڕە (٣٩٣)دا ئاوا پێناسەی جادوو دەکات: ((السِّحرُ: علُوم بكَيفية استِعدَادَاتٍ تَقْدِرُ بِهَا النُّفُوسُ البَشَرِيَّة عَلَى التأثِير في عَالمِ العَنَاصرِ إمَّا بغَير مُعِين أو بِمُعِين مِنَ الأمُور السَّمَاوِيَة، والأَول هُوَ السِّحْر والثَّاني الطِلَسْمَات)) دەڵێ: جادوو چەند زانیارییەکە بە چۆنیەتی وزەو توانایەکان، کە ڕووحە بەشەرییەکان بەهۆیەوە کار دەکەنە سەر جیهانی ماددە، جا چ بەبێ هاوکار، وە چ بەهۆی هاوکارێك لە کاروبارە ئاسمانییەکان، کە یەکەمیان جادوویەو، دووەمیشیان تەلیسمەکانن.

بۆ ڕوونکردنەوەی مەبەستی (ابن خلـدون) دەڵـێین:

ئەو پێی وایە جادوو ئەوەیە کە مرۆڤ تەنیا بەکاریگـەریی ئیـرادەو هیممەتی تایبەتی خۆی پەیدای دەکات، بەڵام طیلـلەسم - کە بە (طِلَّسمات) کۆدەکـرێتەوە - ئەوەیە کە مرۆڤ بەهۆی هاوکاریی وەرگـرتن لـە هۆکارە ئاسـمانییەکان - واتـە: ئەستێرەو خڕۆکەکـان - پەیدای دەکـات.

بـەڵام مـن پـێم وایـە کـە جـادوو (سحر) بـەمانا زاراوەیـیو باوەکـەی بـەبێ هاوکـاریی شـەیتانەکـان نایەتـەدی.

ئنجـا (التهـانوي) لـە کتـێبی (کشّـاف إصطـلاحات الفنـون) کـە کتێبێکـە پێناسەی زاراوەکان دەکات، دەربارەی پێناسەی جادوو، دەڵێ: ((هُوَ الإِتْيَانُ بِخَارِقٍ عِنْدَ مُزَاولَةِ قَوْلٍ أو فِعْلٍ مُحَرَّمٍ فِـي الشَّرعِ، أجرَى اللهُ سبحانهُ سُنَّتَهُ بِحصُولِه عِنْدَهُ ابتِدَاءاً))، واتـە: جادوو بریتیـە لـە پەیـداکردنی شـتێکی یاسـادڕ (شـتێکی نائاسایی) لەکاتی کردنی قسەیەك، یـاخود نوانـدنی ڕەفتارێکـدا، کـە لـە شـەرعدا ئەو قسەیە یان ئەو ڕەفتارە قەدەغەیە، وە خوا ﷻ بەپێی یاسای خـۆی وایدانـاوە، کـە هـەرکاتێ ئەو قسەیە کرا، یان ئەو ڕەفتارە کرا، ئەو کاریگەرییە پەیـدا دەبـێ)، کەواتە: جادووش لە قەدەری خواو لە سنووری یاساکانی خوا بـەدەر نیە.

بـەڵام ئـەوەی کـە بەڕاسـتی پێناسـەیەکی وردو فراوانـی بـۆ کردبـێ، بریتیـە لـە (الآلوسـي) لـە تەفـسیری (روح الـمعاني) بـەرگی (١) لاپـەڕە (٣٣٨)دا، ئـەم پێناسەیەی هێناوە، دەڵێ: ((الـمُرَادُ بِالسِّحرِ أمْرٌ غَرِيبٌ يُشْبِهُ الخَارِقَ ولَيسَ بِهِ، إذْ يَجْرِي فِيهِ التعلّم ويُستعَانُ فِي تحصيله بِالتَّقَرُّبِ إلى الشَّيطَانِ بِارتِكَابِ القَبَائِحِ، قَوْلاً: كَالرُّقَى الَّتِي فِيهَا ألفَاظُ الشِّرْكِ ومَدْحُ الشَّيطَانِ وتَسخِيرهُ، وعَمَلاً: كَعِبَادَةِ النجومِ والكَواكِبِ، والتِزَامِ الجَنَابَةِ وسَائِرِ الفُسُوقِ، واعتِقَاداً: كاستِحسانِ ما يُوجِبُ التَّقَرُّبَ إليهِ مُحبَّتَهُ إيَاهُ، وذَلِكَ لايتمُّ إلاَّ بِمَا يُنَاسِبُهُ مِنَ الشَّرَارَةِ وخُبْثِ النَّفسِ، فإنَّ التَّنَاسُبَ شَرطُ التضامِّ والتَّعَاوُنِ، فَكَمَا أنَّ المَلائِكَةَ لاَ تُعَاوِنُ إلاَّ أخيارَ النَّاسِ المُشَبَّهِينَ بِهِم فِي المواظَبَةِ عَلَى

العِبادَةِ وتَعظيم الله تَعَالى بالقَوْلِ والفعْلِ، وكَذلِكَ الشَّياطِين لا تُعَاوِنُ إلاَّ الأشرَار المُشَبَّهِين بِهِم في الجنابَة والنَجاسَة قَولاً وفِعْلاً واعتِقَاداً، وبِهَذا يَتَمَيَّزُ السَّاحِرُ عَن النَبّي والوَلِي))، واتە: جادوو مەبەست پێی شتێکی سەیرو سەرسوڕهێنەرە کە لە موعجیزە دەچێت، بەڵام موعجیزەش نیە، {بۆیە جادوو جیایە لە موعجیزە، هەروەها لە کەرامەتیش کە لقی موعجیزەیە، چونکە جادوو خەڵك دەتوانێ فێری ببێ، بەڵام موعجیزە تایبەتە بە پێغەمبەرانەوە (علیهم الصلاة والسلام) وە کەرامەتیش تایبەتە بە دۆستانی خواوەو، خەڵك هەرچەندە بیەوێ ناتوانێ فێری ببێ، ئەگەر خوا نەیبەخشێ، واتە: موعجیزەو کەرامەت هەردووکیان بەخشراون، بەڵام جادوو ئینسان فێری دەبێت}[1] جادوو دەگونجێ مرۆڤ فێری ببێ، وە بۆ پەیداکردنی جادوو ئینسان بەهۆی خۆ نزیك خستنەوەی لە شەیتان بە کردنی گوناهو خراپەکاریی، مەداریی ساز دەبێ، چ بە قسەی خراپ، وەك کوفرو ئەو دووعاو قسانەی کە وشەی شیرکیان تێدایەو مەدحی شەیتانیان تێدایە، بۆ ئەوەی هاوکارییان بکات، وە چ کردەوەی خراپ، وەك پەرستنی ئەستێرەو خڕۆکەکان، وە بە لەش پیسیی مانەوەو سەرجەم گوناهەکانی دیکە، یاخود بەشێوەی عەقیدە هەبوون، وەك بە چاك دانانی هەرشتێك کە مایەی لێنزیك بوونەوەی شەیتانو خۆشویستنیەتی جا دیارە ئەوەش تەنیا بەهۆی وەدەستهێنانی خراپەکاریی و پیسییەك دەبێ کە لەگەڵ شەیتاندا گونجاوە، چونکە پێکەوە گونجانو وەك یەك چوون، مەرجی پێکەوە پەیوەستبوونو هاوکاریی پێکەوە کردنە، وەك چۆن فریشتەکان هاوکاریی خەڵکی باش نەبێ ناکەن، ئەوانەی کە لە بەردەوامبوون لەسەر خواپەرستییو خوای بەرز بەمەزنگرتن بە قسەو کردەوەدا، بە فریشتەکان دەچن! بەهەمان شێوەش شەیتانەکانیش تەنیا هاوکاریی ئەو خراپانە دەکەن، کە لە لەش پیسیی و پیسو پۆخەڵییدا بە قسەو کردەوەو عەقیدە پێیان دەچن، وە بەمە جادووگەر لە پێغەمبەرو دۆستی خوا جیادەکرێتەوە.

---

[1] ) ئەوەی نێوان دوو کەوانەکان خۆم زیادم کردوە، بۆ زیاتر ڕوونبوونەوەی مەبەست.

## خاڵی چوارەم: جۆرەكانی جادوو:

هەندێك لە زانایان جادوویان كردۆتە زۆر بەش، بۆ وێنە ئیمام (فخرالدین الرازي) كردوویەتە هەشت بەش، بەڵام بەگشتی جادوو سێ بەشە:

**بەشی یەكەمیان پێی دەگوترێ: جادووی ڕاستەقینە (السِّحر الحَقیقي):**

یانی: ئەو جادووەی كەوا كاریگەریی دەرەكیی هەیەو شوێنەواری دەرەكیی لێدەكەوێتەوە، ئەویش دەبێتە دووبەش: بەشێكی بەهۆی ئیرادەو هێزی مەعنەویی جادووگەرەوەیە، بەبێ ئامرازو هاوكار، دووەمیشیان بەهۆی هاوكاریی شەیتانەكانو، بەهۆی جۆرێك لە خۆ نزیك خستنەوە لە ئەستێرەو خڕۆكەكان، وە بەكارهێنانی چەند جۆرە ماددەیەكو، بەكارهێنانی هەندێك ژمارە بەشێوەی تایبەتەوە، كە ئەوەیان هەندێكیان پێی دەڵێن (طِّلَّسمات)، بەڵام ئەوەی كە من بۆم دەركەوتوە، پەرستنی خڕۆكەو ئەستێرەكانیش، یاخود پەرستنی توخمەكانیش بۆ وێنە: ئەوەی كە ئاگر دەپەرستێ، یان شتی دیكە دەپەرستێ، ئەوەش دیسان هەر بەهۆی هاوكاریی شەیتانەوەیەو، شەیتان لەلایان جوان دەكات، ئەگەرنا خڕۆكەو ئەستێرە بۆ خۆیان ناتوانن یارمەتی كەس بدەنو هیچیان لەدەست نایەت، كەواتە: جۆری یەكەمی جادوو كە پێی دەگوترێ: جادووی ڕاستەقینەو كاریگەریی دەرەكی هەیە، دەبێتەوە بە دوو جۆر:

**یەكەمیان:** هێزی مەعنەویی شەخصەكە دەوری تێدا دەبینێ.

**دووەمیان:** هاوكاریی وەرگرتن لە خڕۆكەو ئەستێرەكانو ژمارەو... هتد، ڕۆڵی تێدا دەگێڕێ.

كە وەك گوتم: لە حەقیقەتدا ئەوە شەیتانە كە لەژێر پەردەی ئەو شتانەدا هاوكاریی ئەو جۆرە كەسانە دەكات، بۆ وێنە: كە دەگوترێ: هیممەتو ئیرادەی بابای جادووگەر كاریگەریی زۆری هەیە، ئەو جادووگەرانە جاری وا هەیە دێن زۆر خۆیان ئەزیەت دەدەن، چەند ڕۆژ خواردن ناخۆن، تەنیا شتی حەرامو پیس نەبێت، وە هیچ قسەیەك ناكەن، تەنیا كوفر نەبێت، وە هەمیشە شتی وادەكەن، شەیتان پێی خۆشبێو زۆر خۆیان ماندوو دەكەنو

خۆیان ئەزیەت دەدەن، تا وایان لێدێ ئیرادەیەکی زۆر بەهێزیان دەبێت، کە وەك پێشتریش باسمکرد بۆ وێنە: بابای کاراتە، مولاکیم، جومناستیك کە دێنێ خۆی زۆر بەهێز دەکاو زۆر مەشق دەکا، دوایی شتی سەیری لێ ڕوودەدات، کابرای جادووگەریش دێنێ خۆی زۆر بەهێز دەکات لەڕووی مەعنەوییەوە، بەڵام بە باری شەڕو خراپەداو دوایی شتی نائاسایی ئەنجام دەدات.

**<u>بەشی دووەمیان پێی دەگوترێ: جادووی خەیاڵی (سِحرُ التخيُّل)</u>:** ئەوەیان کاردەکاتە سەرچاوی خەڵك‌و خەیاڵی خەڵك دەستکاریی دەکات، واتە: کاریگەریی بەسەر شتە دەرەکیەکاندا نیە، بەڵکو لە نێوەوە کار لە ئینسان دەکات، ئەو جادووەی کە جادووگەرانی فیرعەون لە دژی مووسا بەکاریان هێنا، لەمجۆرە بووە، بە بەڵگەی ئەم ئایەتانە کە خوا ﷻ لە سوورەتی (طه)دا، دوای ئەوەی جادووگەرەکان بە مووسا دەڵێن: ئایا تۆ پێشێ شتی خۆت دەکەی، یان ئێمە پێشێ بیکەین؟ دەفەرموێ: ﴿بَلْ أَلْقُوا۟ ۖ فَإِذَا حِبَالُهُمْ وَعِصِيُّهُمْ يُخَيَّلُ إِلَيْهِ مِن سِحْرِهِمْ أَنَّهَا تَسْعَىٰ ﴿٦٦﴾ فَأَوْجَسَ فِى نَفْسِهِۦ خِيفَةً مُّوسَىٰ ﴿٦٧﴾﴾ طـه، واتە: بەڵکو ئێوە بیکەن، ئنجا ئەو پەت‌و گوریس‌و گۆچانانەی فڕێیاندان، وا دەهاتە بەر خەیاڵی مووسا کە دەڕۆن {بوونە مارو دەڕۆیشتن} جا مووسا ترسی ڕێنیشت {کە ئەو جادووە زلەی بینی}، چونکە لە شوێنی دیکە دەفەرموێ: ﴿... وَجَآءُو بِسِحْرٍ عَظِيمٍ ﴿١١٦﴾﴾ الأعراف، جادوویەکی زۆر گەورەیان کرد، هەروەها خوا ﷻ لە سوورەتی (الأعراف)دا دەفەرموێ: ﴿قَالَ أَلْقُوا۟ ۖ فَلَمَّآ أَلْقَوْا۟ سَحَرُوٓا۟ أَعْيُنَ ٱلنَّاسِ وَٱسْتَرْهَبُوهُمْ وَجَآءُو بِسِحْرٍ عَظِيمٍ ﴿١١٦﴾﴾، واتە: جا کاتێك ئەو گوریس‌و پەت‌و گۆچان‌و شتانەی پێیان بوو فڕێیاندان، جادوویان لە چاوی خەڵك کرد {واتە: چاوی خەڵکیان کارتێکرد ترساندیانن}، وە جادوویەکی گەورەیان کرد. کەواتە: ئەمە جۆری دووەمی جادوویە، کە کار لە چاوی خەڵك‌و لە خەیاڵی خەڵك دەکات، کە ئەمە جۆرێکی زۆر باوەو، ئێستاش خەڵك هەیە لەو جۆر جادووە دەکات.

**بەشی سێیەمیان پێی دەگوترێ (السِّحرُ المَجَازِي)**: کە لە ڕاستیدا ئەوەیان جادوو نیە، بەڵام لە شێوەی جادوو دایەو تەڕدەستیی پێ دەڵێن بە عەرەبیی (خِفَّةُ اليَد)ی کە ئەو کەسە لە ئەنجامی ئەوەدا کە جووڵەیەکی خێراو بەپەلە دەکا وادەزانرێ شتێکی کردوەو نەشیکردوە، وە هەندێك جار هەر فێڵێکی عیلمییە، بۆ وێنە:

١) گێڕایانەوە کابرایەك کۆترێکی هێنا، گوتی: چاوتان لێبێ ئێستا ئەو کۆترە دەکوژم‌و مرداری دەکەمەوە، دوایش زیندووی دەکەمەوە ! کۆترەکەی هێنا لە پێش چاویان ملی تێك باهەڵداو بۆی هەڵدان، تەماشایان کرد بە کردەوە وەك بڵێی مردار بۆتەوەو ژیانی تێدا نەماوە، دوایی گوتی: ئەوجار بۆم بهێننەوە، کە بۆیان هێنایەوە، دەستکاریی ملی کردەوەو هاتەوە هۆش، یان بە حیساب زیندوو بۆتەوە، جا ئەوە فێڵەکە لەوە دایە، کە کاتێ ملی تێك باهەڵدەدا، خەڵك وادەزانێ ملی دەشکێنێ، بەڵام وانیەو ماددەیەکی بێهۆشکەری لێدەداو کۆترەکە بێهۆش دەبێت‌و وەك مردووی لێدێ، لە دوایەش ڕا ماددەیەکی دیکەی لەدەست دایە، لێیدەداو دێتەوە هۆش! ئەوانەی تەماشاش دەکەن وادەزانن مردووەو زیندووی کردۆتەوە !

٢) یان مەسەلەی سەربڕین: جاری وایە کیسەیەکی نایلۆن کە هەستی پێناکرێ لە ملی کابرایان داناوە، تۆ وا هەست دەکەی سەردەبڕدرێت‌و خوێنی لێدێت، دوایی پێی دەڵێ: هەستەوە، هەڵدەستێتەوە ! کە لە حەقیقەتدا سەرنەبڕاوە.

٣) یان بۆ وێنە: وەستاندنی سەعات، کابرا موگناتیسێکی زۆر بەهێزی پێیە، دەڵێ: ئێستا ئەو سەعاتە ڕادەگرم، خەڵك موگناتیسەکە نابینێ، ئیدی حەرەکەیەکی لەگەڵ دەکات‌و دەیوەستێنێ‌و دوایی دەیخاتەوە ئیش، ئەوانە پێیان دەگوترێ: (تەڕدەستیی)، واتە: لە حەقیقەتدا جادوو نیە، بەڵام لە شێوەی جادوو دایە، بۆیە زانایان گوتوویانە: ئەو جۆرانەش ئەگەر بەناوی جادووەوە بکرێن، هەر قەدەغەو حەڕامن، چونکە دەبنە هۆی چەواشەکاریی خەڵك.

**خاڵی پێنجەم: ئایا سنووری جادوو تا كوێیەو حەقیقەتی هەیە، یان نا؟ واتە تا كوێ دەڕوا، تا كوێ بڕەكات؟**

لە حەقیقەتدا زانایان لەوبارەوە زۆر مشتومڕیان بووەو ڕا جیاییان هەیە، جارێ هەندێكیان دەڵێن: جادوو حەقیقەتی هەرنیە، كە (مُعْتَزِلَة) ڕایان وابووە، وە ئیبن حەزمی ئەندەلوسیی و كۆمەڵێك لە زانایان ڕایان وایە، دەڵێن: بەڵكو بەس ئەوەیە كە كاریگەریی بۆ سەر چاوی خەڵك هەیەو خەڵك فریودەدا، بەلام لە حەقیقەتدا ئەوەی كە ئەوان دەیڵێن: هەم پێچەوانەی ئایەتی خوایەو، هەم پێچەوانەی سوننەتی پێغەمبەریشە ﷺ، پێچەوانەی ئایەتی خوایە، چونكە خوا دەفەرموێ: ﴿... يُفَرِّقُونَ بِهِۦ بَيْنَ ٱلْمَرْءِ وَزَوْجِهِۦ ... ﴿١٠٢﴾﴾البقرة، مانای وایە جادوو زیان لە خەڵكی دەداتو ژنو مێردان لێك دەترازێنێ، وە پاشان پێچەوانەی سوننەتی پێغەمبەرە ﷺو پێغەمبەری خوا بۆخۆی جادووی لێكراوە، وەك لە (صحيح)ی بوخاریی و موسلیم داهاتوە (لبيد بن الأَعْصَم اليَهُودي) جادووی لێكردوە[1]، تا دوایی خوای پەروەردگار ئاگاداری كردۆتەوە، كە جادووەكە لە كوێ شێرراوەتەوەو (معوِّذتين)ی بۆ ناردوە (الفلق والناس) وە خوێندوونیو جادووەكە هەڵوەشاوەتەوە[2]، (القُرطُبي) لەوبارەوە دەڵێ: {(قَالَ عُلَمَاؤنا: لاَ يُنْكَرُ أن يظهر عَلى يَد السَّاحِرِ خَرْق العَادات مِمَّا هو في مقدور

---

١) بڕوانە: (صحيح البخاري): ٣٢٦٨، وە (صحيح مسلم): ٢١٨٩ .

٢) هەندێك لە زانایان پێیان وایە جادوو لێكرانی پێغەمبەر ﷺ پێچەوانەی پارێزراو (معصوم) بوونیەتیو ڕاست نیە جادووی لێنەكراوە، هەروەها دەڵێن: ئەوە قسەی كافرەكان بەڕاست دەگێڕێ كە دەیانگوت: جادووی لێكراوە: ﴿... إِن تَتَّبِعُونَ إِلَّا رَجُلًا مَّسْحُورًا ﴿٤٧﴾﴾الإسراء ، بەلام من پێم وایە نەخۆش كەوتنی پێغەمبەری خوا ﷺ لەڕووی جەستەییەوە بەهۆی جادووەوە، پێچەوانەی پارێزراو بوونی نیە، چونكە بەشتی دیكەش نەخۆش كەوتوە، وە قسەی كافرەكانیش بەڕاست ناگێڕێ، چونكە ئەوان مەبەستیان تێكچوونی عەقڵو هۆشی بووە، نەك نەخۆش كەوتنی !

البَشَر مِن مَرَضٍ وَ تَفْرِيقٍ وَ زَوَالِ عَقل وَتعويج عضوٍ إلى غَيرِ ذَلِكَ) (الجَامع لأحكام القُرآن، ج: (٢)، ص: (٤٧)}، واتە: زانایانی ئێمە (زانایانی ئیسلام) گوتوویانە: نكوولّیی لەوە ناكرێ كە لەسەر دەستی باباى جادووگەر شتی وا دەربكەوێ كە پێچەوانەی عادەتە، بەلام لە سنووری توانای ئینساندایە، وەك: نەخۆشیی و لێك جیاكردنەوەو، بێهۆشكردنیو، گۆجكردنی دەستو پێو شێوەی ئەوانە.

(ابنُ حَجَرالعَسْقَلَاني) دەلێت: {(الذينَ قالوا: إنَّ لَهُ حَقيقة اختلَفوا هَلْ لَهُ تأثير فَقَطْ بحيث يغَيّر المِزاج فيكُونُ نوعَاً مِنَ الأمرَاض أو هو يَنتهي إلى حَالَةٍ بحَيث يُصَيِّرُ الجَمَادُ حَيوَاناً وعَكْسَهُ ؟ فالذي عَلَيهِ الجمهور هو الأول) (فتح الباري، ج: (١٠)، ص: (٣٢٢)}، واتە: جا ئەوانەی دەلێن: جادوو حەقیقەتی هەیە، ڕا جیان كە ئایا حەقیقەتەكەی هەر ئەوەندەیە كە میزاجو سروشتی خەلك تێكدەدا، وەك نەخۆش كردن، یاخود حەقیقەتی شتەكانیش هەلدەگێڕێتەوە، وەك بلێی ئینسان دەكات بە ئاژەلّ، وە بە پێچەوانەوەش زۆربەیان لەسەر ئەوەن كە نەخێر تا ئەوێ بڕ ناكاتو هەر ئەوەندەیە كە میزاجو سروشتی ئینسان تێكدەدا.

كەواتە: كە جارى وایە بە جادوو ئینسانێ دەكرێ بە حەیوان، یان حەیوانێ دەكرێ بە ئینسان، ئەوە لە ڕاستیدا بەس چاو هەلخەلّەتاندنە، ئەگەرنا حەقیقەتی شتەكە نەگۆڕراوە.

(ابن حَجَر الهَيثمَي)یش دەلێ[1]: ((اختلَفَ العُلَمَاءُ في أنَّ لِلسِّحرِ حَقِيقَةً أم لاَ ؟ فَقَالَ بَعْضُ العُلَمَاءِ: أنَّهُ تخييلٌ لا حَقِيقَةُ لَهُ وقالَ الأكثرونَ وهو الأصَحّ الَّذي دَلَّتْ عَلَيهِ السُّنَّة، لَهُ حَقِيقَة))، واتە: زانایان كەوتوونەتە ڕاجیاییەوە لەوەدا، كە ئایا جادوو حەقیقەتی هەیە یان نا ؟!

---

١) (الزواجر عن اقتراف الكَبائر، ج (٢)، ص (١٠٠).

هەنـدێکیان گوتوویانـە: حەقیقـەتی نیـەو بـەس چـاو هەڵخەڵەتاندنـە، بـەڵام زۆربـەیان دەڵـێن: حەقیقـەتی هەیـە، کـە ئـەوەش ڕاستتـرە، بەڵگـەی سـوننەتی لەسەرە، بەڵام بێگومان حەقیقەتەکەی تا ئەو شوێنە بڕناکات، کە جەوهەری ئەو شتە بگۆڕێ، بەڵکو دەستکاریی میزاج و سروشتی ئینسان دەکات، یاخود هەندێ شت لە حاڵێکەوە بۆ حاڵێك دەگۆڕێ، لێرەدا بەپێویستی دەزانم ئەوەش بڵێم: کە هەر شتێك لە واقیعدا بەشێوەیەکی هەستپێکراوو زانراو بوونی هەبوو، سەلماندنی بوونی پێویستی بە بەڵگەی شەرعیی (نقل)ی ناکات، چونکە عەقڵیش هەر بەڵگەی شەرعییە، وە بەڵگەی نەقڵیی بۆ شتێك پێویستە، کە عەقڵ دەلالەتی لەسەر نەکات، بەڵام شتێك کە لە واقیعدا هەبێت عەقڵ دەرکی پێبکات و بە ئەزموون هەست پێبکرێ، پێویستیمان بە بەڵگەی نەقڵیی ناکات بۆ سەلماندنی.

بۆ وێنە: کاریگەریی جادوو لەوانەیە، کە پێویستیی بە بەڵگەی نەقڵیی ناکات، پاش ئەوەی کە ئێمە لە واقیعدا دەبینین جادوو خەڵك نەخۆش دەکات، بەڵکو جاری وایە خەڵك دەکوژێ، وە خەڵك تووشی ناڕەحەتیی دەکات و، ژن و مێرد لێك دەکات بە دەقی قورئان، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئێمە ئەگەر تەماشای چەند ئایەتێك بکەین، بەڵگەی زۆر ڕوون و ڕاشکاون کە جادوو کاریگەریی و حەقیقەتی هەیە:

<u>یەکەم</u>: کە خوا دەفەرموێ: ﴿ ... يُفَرِّقُونَ بِهِۦ بَيْنَ ٱلْمَرْءِ وَزَوْجِهِۦ ... ﴿١٠٢﴾ ﴾ البقرة، واتە: بەهۆی جادووەوە پیاو و ژنەکەی لێك جیا دەکەنەوە .

<u>دووەم</u>: کە خوا دەفەرموێ: ﴿ وَمِن شَرِّ ٱلنَّفَّـٰثَـٰتِ فِى ٱلْعُقَدِ ﴿٤﴾ ﴾ الفلق، واتە: (بڵێ پەنا دەگرم بە خوا) لە خراپەی ئافرەتانی جادووگەر کە فوو بە گرێیەکاندا دەکەن، جا ئەگەر جادوو کاریگەریی نەبێ، ئەو دووعایە بۆچی؟

<u>سێیەم</u>: کە خوا دەفەرموێ: ﴿ سَحَرُوٓاْ أَعْيُنَ ٱلنَّاسِ وَٱسْتَرْهَبُوهُمْ ... ﴿١١٦﴾ ﴾ الأعراف، واتە: جادوویان لە چاوی خەڵك کردو ترساندیانن، مانای وایە جادوو کاریگەریی و حەقیقەتی هەیە.

چوارەم: پێغەمبەر ﷺ لە فەرمایشتێكدا فەرموویەتی: {(اجْتَنِبُوا السَّبْعَ الْمُوبِقَاتِ، قيل: يا رسول الله وما هُنَّ؟ قال: الشرك بالله، والسِّحر، وقتل النفس التي حرَّم الله الاّ بالحق، وأَكْلُ مال اليتيم، وأَكْلُ الرِّبا، والتولِّي يوم الزَّحف، وقذف المحصنات الغافلات المؤمنات) (رَوَاهُ الْبُخَارِيُّ برقم: (٢٧٦٦)، وَمُسْلِم برقم: (٢٥٨)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٢٨٧٤)، وَالنَّسَائِيُّ برقم: (٣٦٧٣)، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه}، واتە: خۆتان لە حەوت (گوناهە) فەوتێنەرەكان بپارێزن، گوترا: ئەوانە چین ئەی پێغەمبەری خوا ؟ فەرمووی: هاوبەش بۆ خوادانان‌و، جادووكردن‌و، بە ناهەق كوشتنی نەفسێك كە خوا قەدەغەی كردووە، خواردنی ماڵی هەتیوو، خواردنی سووو، لە كاتی هێرشی دوژمندا پشت تێكردنی‌و بوختانكردن بۆ ئافرەتانی پاكی بێئاگای بڕوادار .

## خاڵی شەشەم: جیاوازیی نێوان جادووو موعجیزەو كەرامەت چییە؟

موعجیزە كە تایبەتە بە پێغەمبەرانەوە (علیهم الصلاة والسلام)و كەرامەتیش هی دۆستانی خوایە، لەگەڵ جادوودا شەش جۆرە جیاوازییان هەن:

١- موعجیزە كە تایبەتە بە پێغەمبەرانەوە (علیهم الصلاة والسلام)، وە كەرامەتیش كە هی دۆستانی خوایە، هەردووكیان بەخشراو (وهب)ن‌و بەدەستی خۆیان نیە، كە خوا پێیان دەدا، واتە: هیچ پێغەمبەرێك لەو كاتەدا كە بۆخۆی ویستوویەتی مادام خوا نەیویستبێ، نەیتوانیوە موعجیزەكەی پێشانبدا، وە هیچ دۆستێكی خوا كە لەو كاتەدا بۆخۆی دەیەوێ، ناتوانێ ئەو شتەی كە نائاسایی (خارق العادة)یە پێشان بدات، بەڵكو تەنیا لەو كاتەی كە خوا دەیداتێ‌و مۆڵەتی لەسەرە، دەتوانێ ئەوە بكات.

بەڵام جادوو وەدەستهێنراو (مُكْتَسب)ە، وە لەو كاتەدا كە جادووگەر دەیەوێ دەتوانێ بیخاتەڕوو، بەڵگەش بۆ ئەوە كە موعجیزەی پێغەمبەران (وهبي)یەو (كَسبي)ی نیە، ئەوەیە كە لە سووڕەتی (الرعد)دا خوا ﷻ دەفەرموێ:

﴿...وَمَا كَانَ لِرَسُولٍ أَن يَأْتِيَ بِـَٔايَةٍ إِلَّا بِإِذْنِ ٱللَّهِ ۗ لِكُلِّ أَجَلٍ كِتَابٌ ﴿٣٨﴾﴾، واتە: هیچ پێغەمبەرێك بۆی نیە موعجیزەو بەڵگەیەك بێنی، مەگەر بە مۆڵەتی خوا، هەروەها دەربارەی ئەوە، كە كەرامەتی دۆستانی خواش بەهەمان شێوەیەو بەخشراوە، ئەوەیە كە خوا دەفەرموێ: ﴿... كُلَّمَا دَخَلَ عَلَيْهَا زَكَرِيَّا ٱلْمِحْرَابَ وَجَدَ عِندَهَا رِزْقًا ۖ قَالَ يَٰمَرْيَمُ أَنَّىٰ لَكِ هَٰذَا ۖ قَالَتْ هُوَ مِنْ عِندِ ٱللَّهِ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ يَرْزُقُ مَن يَشَآءُ بِغَيْرِ حِسَابٍ ﴿٣٧﴾﴾ آل عمران، واتە: هەركاتێك زەكەریيا لە مەریەم دەچووە ژووری میحراب ڕۆزییەكی تایبەتی لەلا دەبینی، گوتی: ئەی مەریەم ئەمەت لەكوێ بوو؟ گوتی: ئەوە لە خواوەیە، خوا ڕۆزیی دەدات بە هەركەسێ كە بیەوێ بەبێ حیساب. بەڵگەی ئەوەش كە جادوو شتێكە مرۆڤ فێری دەبێتو عیلمێكە فێری دەبێت، بەڵام عیلمێكی خراپە، ئەم شتانەن:

**یەكەم:** لە سوورەتی (البقرة)دا دەفەرموێ: ﴿...فَيَتَعَلَّمُونَ مِنْهُمَا مَا يُفَرِّقُونَ بِهِۦ بَيْنَ ٱلْمَرْءِ وَزَوْجِهِۦ ... ﴿١٠٢﴾﴾، واتە: لەو دوو فریشتانەوە جادوویەك فێردەبوون، كە ژنو مێردی پێ لەیەك جیابكەنەوە.

**دووەم:** لە سوورەتی (طه)دا دەفەرموێ: ﴿...إِنَّمَا صَنَعُوا۟ كَيْدُ سَٰحِرٍ... ﴿٦٩﴾﴾، واتە: ئەو فێڵەی كە جادووگەرەكان كردیان فێڵی جادووگەرە، جا وشەی (صَنَعُوا)، واتە: بە وەستاییو وردەكارییەوە كردیان.

**سێیەم:** هەروەها كە لە سوورەتی (یونس)دا دەفەرموێ: ﴿فَلَمَّآ أَلْقَوْا۟ قَالَ مُوسَىٰ مَا جِئْتُم بِهِ ٱلسِّحْرُ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ سَيُبْطِلُهُۥٓ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُصْلِحُ عَمَلَ ٱلْمُفْسِدِينَ ﴿٨١﴾﴾، واتە: جا كاتێك پەتو گۆچانەكانیان فڕێدا، مووسا گوتی: ئەوەی كە ئێوە هێناتان جادوویەو خوا هەڵی دەوەشێنێتەوە، چونكە بێگومان خوا كردەوەی خراپەكاران بەئاكام ناگەیەنێ، كەواتە: جادوو كردەوەیەكە كە بە كارامەییو لێزانییەوە دەكرێ.

(ابن خلدون) لە پێناسەی موعجیزەو جادوودا دەڵێ: {(المُعجِزَة قُوَة إلهيَة تبعَث في النَّفسِ ذَلِكَ التأثير فهوَ مُؤَيَّدُ بروحِ الله عَلَى فعلِهِ ذَلك) (المقدمة، ص (٣٩٣)}، واتە: موعجیزە هێزێکی خواییە لە نەفسی ئینساندا پەیدا دەبێتو، ئەو کاریگەرییەی هەیە بە هۆی یارمەتی خواوە، کە یارمەتی ئەو پێغەمبەرە دەدا لەسەر ئەوشتە، بەڵام جادووگەر وەك پێشتر گوتمان، بۆخۆی لەلای خۆیەوە شتەکە دەکات، بەقوەتی نەفسی خۆی، نەك بە یارمەتی خوای پەروەردگار بەڵکو هەندێك جار بە هاوکاریی شەیتانەکانو هەندێك جاریش بەهۆی ئەو خۆ بەهێزکردنەوە، کە بەشێوەی خراپ خۆی بەهێزکردوە.

٢- موعجیزە تەنها لەسەر دەستی پێغەمبەران ﷺ پەیدادەبیو کەرامەتیش تەنیا لەسەر دەستی ئینسانێکی بۆ خوا صوڵحاوو پارێزکارو بۆ خوا عابیدو خۆ لە گوناح پارێزو پابەند بە شەریعەت، پەیدادەبێت.

بەڵام جادوو بە پێچەوانەوە تەنیا لەسەر دەستی ئینسانی گوناهبار پەیدادەبێتو، هیچ جادووگەرێك نیە بتوانێ جادوو بکات هەتا کافر نەبێت، نەك هەر کافر بەڵکو دەبێ کافرێکی زۆر پیس بێو کردەوەی زۆرخراپی هەبێتو، تەنانەت لەڕووی جەستەییشەوە دەبێ زۆر پیسو پۆخڵ بێ، وە لەڕووی مەعنەوییشەوە زۆر پیس بێتو خاوەنی عەقیدەیەکی زۆر خراپ بێتو، قسەی زۆر پیسو خراپ بکاتو کردەوەی زۆر ناشیرینو خراپی هەبێ، هەرچەندە جاری واش هەیە جادووگەرەکان بە فەرمانی شەیتان بۆ چاوبەستی خەڵك ئایەتیش دەخوێننەوە، وە ڕەنگە دووعاش بکەنو قسەی باشیش بکەن، کە ئەوەش هەر بە فێڵو تەڵەکەی شەیتانە بۆ ئەوەی کە خەڵك چەواشە بکرێو بە چاکیان بزانن، بۆیە، (ابنُ حَجَرالعَسْقَلاني) دەڵێت: {(يَنبَغي أن يُعْتَبر بِحَالِ مَن يَقَعُ الخَارِقُ مِنهُ فإن كَانَ مُتَمَسِّكاً بالشَّرِيعَةَ مُتجَنِّباً لِلمُوبِقات، فالَّذي يَظهَر علَى يَدِهِ مِن الخَوارق كَرَامَةٌ، وَإلاَّ فَهُوَ سِحرٌ لأنهُ نَشَأ عَن أحَد أنواعهِ كَإعَانةِ الشَّيَاطِين) (فتح الباري،

ج: (١)، ص: (٢٢٣)}، واتە: دەبێت تەماشای حاڵی ئەو كەسە بكرێت كە ئەو شتە یاسادرِ (نائاسایی)یەی لێی دەبینرێ، جا ئەگەر ئەو ئینسانە پابەندبوو بە شەریعەتەوەو، خۆ پارێز بوو لە گوناهان، ئەوە ئەوەی كە لەسەر دەستی دەردەكەوێ {دیارە پێغەمبەران (علیهم الصلاة و السلام) ئێستا نەماون‌و بە (محمد المصطفى) خەتم بوون‌و ئێستا بەس دۆستانی خوا هەن} لە شتی یاسادرِ، ئەوە كەرامەتە، بەڵام ئەگەر وا نەبێت‌و پابەندنەبێ بە شەریعەتەوەو ئینسانی باش نەبێت، ئەوە دیارە جادوویە.

هەروەها (ابن خلدون) لە (المقدمة) لە لاپەڕە (٣٩٥)دا، دەڵێت: {السَّاحِر لاَ يصدرُ منه الخَير ولاَ يَستَعْمِل أسبَاب الخَير، وَصاحِب المُعْجِزَة لا يصدُر منه الشرُّ وَلا يَسْتَعْمِل أسبَاب الشّر، فهمَّا عَلَى طَرَفي النَقيض}، واتە: جادووگەر تەنیا خراپەو شەڕی لەدەست ڕوودەدا، وە تەنیا خەریكی خراپەیە، بەڵام خاوەن موعجیزە {كە پێغەمبەرانن (علیهم الصلاة والسلام)} تەنیا خێرو چاكەیان لەسەر دەست ڕوودەداتو تەنیا بە خێرو چاكەشەوە سەرگەرمە، كەواتە: ئەو دووانە ڕاست لەگەڵ یەكدا دژو پێچەوانەن، (دیارە دۆستانی خواش بە هەمان شێوە).

٣- جیاوازی سێیەم: ئەوەیە كە موعجیزەی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) ڕواڵەت‌و پەنهانی یەكەو، هەتا لێی ووردبیەوە زیاتر دێیە قەناعەت كە هەقەو ڕاستە، ئنجا هیچ كەسیش وەك وی ناتوانێ بێنێ.

بەڵام جادووی جادووگەران بەزۆری چاوبەست‌و هەڵخەڵەتاندنە، وە دوای لێوردبوونەوەش، بۆت دەردەكەوێ، كە ئەوە جادووەو فێڵە، وە پاشان جادووگەرێكی دیكەی وەك وی یان لەو بەتواناتر، دەتوانێ جادووی وەك ئەو یان لەو خراپتریش بێنێ، بەڵام موعجیزەی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) تەنیا خۆیان دەتوانن‌و كەس ناتوانێ لە بەرانبەریاندا بوەستێ‌و، شتێكی وەك ئەوەی وان بكات.

٤- جیاوازی چوارەم: ئەوەیە كە موعجیزە بە كەس بەرپەرچ نادرێتەوە، بەڵام جادوو بەتاڵ دەكرێتەوەو بەرپەرچ دەدرێتەوە، وەك تەجرەبە كراوە كابرا لە گەرمەی جادووكردنەكەیدا بووە، پیاوێكی چاكو دیندار (آية الكُرسي) خوێندوە، یاخود (لاَ إلهَ إلاّ الله)ی كردوە، هەڵبەتە ئەوەش بە هەموو كەس ناكرێو دەبێ ئیمانێكی باشو تەقوایەكی باشو یەقینێكی باشی هەبێ، ئنجا ئەو ئایەتە كە دەیخوێنێ كاریگەریی دەبێت، یەكسەر ئەو جادووە بەتاڵ بۆتەوە، هەڵبەتە هەتا جادووەكە بەقوەتتر بێت دەبێت لە بەرانبەردا ئەم ئینسانە مسوڵمانەش دڵەكەیو ئیرادەو ئیمانەكەی بەقوەتتر بێت، ئەوجار پێی هەڵدەوەشێتەوە، مەبەستم لەم ڕوونكردنەوەش ئەوەیە كە ئەگەر هەركامێكتان جادووگەرێكی بینی ئایەتێكی خوێندەوەو جادووەكەی بۆ هەڵنەوەشایەوە، لە شتەكە نەكەوێتە گومانەوە، ئەوە دیارە جادووەكە زۆر پیسو بەهێزەو، دەبێ ئەو دووعایەش لە دڵێكی زۆر بەقوەتەوە بێتو، ئینسانێكی زۆر خاوەن ئیمانو یەقین بیكات، ئەگەرنا تەرازوو نایەنەوەو هاوكوفی یەك نابنو پێی هەڵناوەشێتەوە.

٥- جیاوازی پێنجەم: ئەوەیە كە موعجیزە لە ڕۆژگارێدا تەنیا یەك كەس دەتوانێ بیكات، ئەویش ئەو پێغەمبەرەیە كە خوا ناردوویەتی.

بەڵام جادوو چەند جادووگەر هەبن، هەموویان دەتوانن بیكەن.

٦- جیاوازی شەشەم: ئەوەیە كە موعجیزە تەحەددای پێدەكرێو ئەو كەسەی موعجیزەی لەدەست ڕوودەدات كە پێغەمبەرانن دەڵێ: من پێغەمبەری خوام، بەڵگەشم لەسەر ئەوە كە پێغەمبەری خوام، ئەم بەڵگەو موعجزەیەیە.

بەڵام جادوو وانیەو، خوا ناهێڵێ جادووگەران ئیددیعای پێغەمبەرایەتی بكەن، یان چاووڕووی ئەوەیان نیە، هەڵبەتە زانایان لەوبارەوە دوو ڕایان هەن، هەندێك دەڵێن: خوا لایاندەداتو ناهێڵێ ئیددیعای پێغەمبەرایەتی بكەن، هەندێكیش دەڵێن: نەخێر هەر لەڕاستیدا لە خۆیان ڕانابینن، ئەو ئیددیعایە بكەن، دیارە ئەگەر گریمان ئیددیعاش بكەن حاڵو باڵیان دیارەو مەیدانی درۆیان كورتە !.

## خاڵی حەوتەم: ئایا ئینسان چۆن دەبێتە جادووگەر؟

ئەوە دەمەوێ بزانن کە بابای جادووگەر، ئینسانی جادووگەر، چ پیاو بێ چ ئافرەت، چ جۆرە کەسایەتییەکیان هەیە؟ دەنا لێرە مەبەستمان ئەوە نیە کە خەڵکی فێربکەین چۆن دەبنە جادووگەر !! بەڵکو دەمانەوێ کە جادووگەران بناسن، خاوەنی چ جۆرە کەسایەتییەکن، چۆنن و چۆننین؟

**یەکەم:** تەنیا کاتێك ئینسان دەبێت بە جادووگەر، کە بەتەواویی تەسلیمی شەیتان بووبێ وەك چۆن کەسێك بەڕاستی ئیماندارو دۆستی خوایە، کە خۆی بە خوا فرۆشتبێ: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ ٱشْتَرَىٰ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ أَنفُسَهُمْ وَأَمْوَٰلَهُم بِأَنَّ لَهُمُ ٱلْجَنَّةَ ... ﴿١١١﴾ ﴾ التوبة، ئینسانیش وەختێك دەبێتە جادووگەر، کە بەیەکجاریی، تەسلیمی شەیتان ببێت، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ عَلِمُوا۟ لَمَنِ ٱشْتَرَىٰهُ مَا لَهُۥ فِى ٱلْـَٔاخِرَةِ مِنْ خَلَٰقٍ ... ﴿١٠٢﴾ ﴾ البقرة، واتە: وە دەزانن کە هەر کەسێك جادوو بەدەست بێنێ، لە دوارۆژدا هیچ بەشی نیەو، دەستی بە تاڵەو ئەهلی دۆزەخە، ئنجا دەفەرموێ: ﴿ وَلَبِئْسَ مَا شَرَوْا۟ بِهِۦٓ أَنفُسَهُمْ ﴾، بەواتای (لَبِئسَ ماباعوا بِهِ أنفُسَهُم)یانی: ئەوە خراپترین شتە کە خۆیان پێ فرۆشتوە، کەواتە: کاتێك ئینسان جادووی بۆ دەکرێ کە خۆی بفرۆشێ، بەکێ؟ بە شەیتان، چونکە سەرچاوەی جادوو شەیتانە، وە ئینسانیش هەتا خۆی تەسلیمی شەیتان نەکا، جادووی بۆ ناکرێ.

**دووەم:** دەبێ بابای جادووگەر زۆر دژی خوابێ و زۆر ڕقی لە خوابێ و دژی دینی خوابێ، وە دژی هەموو کتێبە ئاسمانییەکان بێت، وە ڕقی لە فریشتەکان بێت، وە ڕقی لە هەموو ئیمانداران بێ، وە ڕقی لە هەموو شتێکی چاك و پاك بێ هەتا، ئەو حاڵەتانەی نەبێت، ناتوانێ ببێتە جادووگەر.

(ابن تیمیة) ڕەحمەتی خوای لێبی، لەوبارەوە دەڵێت: {(یَکتبونَ کَلامَ اللهِ بالنجَاسَةِ وَقد یَکتبونَ حُروفَ کَلام اللهِ ﷻ بنَجَاسَةِ إما دَمٍ وَ إمَّا غَیرِهِ أو یَکتبونَ غَیر ذلكَ مِمَّا یُرضي الشَّیطانَ أو یَتکَلمونَ بِذَلِكَ) (مجموعة

الرسائل المنيرية، ج: (٢)، ص: (١٢١)}، واتە: فەرموودەی خوا (قورئان) بە پیسیی دەنووسن، وە جاری وایە پیتەکانی فەرمایشتی خوای زاڵو پایەدار بە پیسیی دەنووسنەوە، خوێن یان غەیری خوێن، یان شتی دیکەی وا دەنووسن، کە شەیتان حەزی لێبکات، یان بە قسە دەیڵێن.

**سێیەم:** دەبێ بابای جادووگەر حەتمەن پیسو پۆخڵ بێو، مەرجیش نیە ئەو پیسو پۆخڵییە هەموو دەمێ خەڵك بیبینێ، بەڵام دەبێ لەڕووی مەعنەوییەوە پیس بنو، هەتا لەڕووی جەستەییشەوە ئەو کاتەی کە خەریکی وەرزشی مەعنەویی دەبن، کە جادوو فێردەبن یان جادوو دەکەن، دەبێت لە شوێنێك بن کە زۆر بە پیسییەوە سەرگەرم بن (لێرەدا نامەوێ هەموو تەعبیرێك بەکاربهێنم، جاری وا هەبووە بابای جادووگەر ئێمە ناسیوومانە شتی هێندە پیسی کردوە، کە ئینسان ناکرێ لەم دەرسانەدا باسی بکات!).

چوارەم: بابای جادووگەر کاتێ دەتوانێ جادوو بکات، کە گوناهە گەورەکان هەموو بکات و هیچ طاعەتێکی نەبێت، بە کورتی: هەرچی خوا پێی خۆشە نەیکاتو هەرچی خوا پێی ناخۆشە بیکات.

(ابن القيم الجوزية) لەوبارەیەوە دەڵێ: {(وكُلَّمَا كَانَ السَّاحِرِ أكفر وأخْبَثَ وأشدّ مُعَادَاةً للهِ ولرَسولهِ ولِعبَادِهِ المؤمنين، كَانَ سِحرهُ أقوى وَأَنْفَذُ) (التفسير القيم، ص: (٥٨١)}، واتە: کابرای جادووگەر تا کافرتربێو پیستربێو زیاتر دژی خواو پێغەمبەرو بەندە ئیماندارەکانی بێ، ئەوە جادووەکەی بەهێزترو کاریگەرتر بێ، کەواتە: بەو شتانە ئینسان دەبێتە جادووگەر: بەهەرچی خراپەو پیسە.

## خاڵی هەشتەم: حوکمی فێربوونو فێرکردنی جادوو؟

لە ڕاستیدا زانایان هەموویان لەسەر ئەوە یەك دەنگن کە جادوو فێری خەڵك کردن کوفرە، وە جادووکردن گوناهی گەورەیەو هەشیانە دەڵێ: کوفرە، وە فێربوونی جادووش زۆربەی هەرە زۆریان لەسەری ڕێککەوتوون، کە ئەویش

گوناهی گەورەیەو هەیانە دەڵێن: کوفریشە[1]، دیارە بەڵگەش لەوبارەوە زۆرن‌و ڕوون‌و ڕاشکاون، بۆ نموونە:

ئەوە کە خوا دەفەرموێ: ﴿ وَمَا يُعَلِّمَانِ مِنْ أَحَدٍ حَتَّىٰ يَقُولَا إِنَّمَا نَحْنُ فِتْنَةٌ فَلَا تَكْفُرْ ﴾، وە فریشتەکان کەسیان فێری جادوو نەدەکرد، هەتا پێیان نەگوتبایە: ئێمە بۆ تاقیکردنەوەین خۆت کافر مەکە! کەواتە: کەسێك فێری جادووبی، کافر دەبی‌و فێربوونی جادوو کوفرە.

بەڵگەش لەسەر ئەوە کە خەڵك فێرکردنی جادوو، لە هەموو حاڵاندا هەر کوفرە، ئەوەیە خوای پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿ وَمَا كَفَرَ سُلَيْمَـٰنُ وَلَـٰكِنَّ ٱلشَّيَـٰطِينَ كَفَرُوا۟ يُعَلِّمُونَ ٱلنَّاسَ ٱلسِّحْرَ ﴾، واتە: وە سولەیمان ﷺ کوفری نەکرد، بەڵکو شەیتانەکان کافربوون کە خەڵکیان فێری جادوو دەکرد، کەواتە: هەرکەسێك خەڵك فێری جادووبکا، مانای وایە کافر دەبێ، ئنجا چ فێربوونی چ فێرکردنی، ئەم ئایەتە کە دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ عَلِمُوا۟ لَمَنِ ٱشْتَرَىٰهُ مَا لَهُۥ فِى ٱلْـَٔاخِرَةِ مِنْ خَلَـٰقٍ ۚ وَلَبِئْسَ مَا شَرَوْا۟ بِهِۦٓ أَنفُسَهُمْ ۚ لَوْ كَانُوا۟ يَعْلَمُونَ ﴾، بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە هەردووکیان، کوفرن، بەڵام (النووي) لە (شرح صحيح مسلم)دا هێناویەتی کە (فتح الباري) لە لاپەرە (٢٢٤) لێی نەقڵ دەکات، دەڵێت: ((عَمَلُ السِّحرِ حَرَامٌ وهو مِنَ الكَبَائِرِ بالإجماعِ وَقد عَدَّهُ النَّبيّ ﷺ مِنَ السَّبعِ المُوبِقَاتِ وفيهِ مَا يَكونُ كُفراً وَمِنهُ مَالاَ يَكونُ كُفراً بَل مَعصيَةً كَبيرَةً))، واتە: کردەوەی جادووگەریی (واتە کردنی‌و فێربوونی‌و فێرکردنی) حەرامەو یەکێکە لە گوناهە گەورەکان بەیەك دەنگیی زانایان، وە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: یەکێکە لە حەوت گوناهە فەوتێنەرەکان، جا جاری وایە جادوو کوفرەو، جاری واشە تەنیا گوناهی گەورەیە.

---

١) بەڵام ئەم قسەو فەتوایانە تەفصیل‌و ڕوونکردنەوەیان هەیە، کە لە درێژەی قسەکاندا باسی دەکەین، واتە: چ کاتێك جادووکردن، یان فێربوونی کوفرەو چ کاتێك وانیە، بەڵام جادوو فێری خەڵك کردن، هەمیشە هەر کوفرەو هەڵاواردنی تێدانیە.

هەرچەندە هەندێك لە زانایان دەڵێن: جادوو هەمووی هەر كوفرە، وەك پێشتریش باسمان كرد، بەڵام لێرەدا پێویستە ئاگاتان لە شتێك بێ: (فخرالدین الرازي) لە تەفسیرەكەی خۆی (مفتاح الغیب)دا، قسەیەكی هێناوە كە بەڕاستی قسەیەكی ڕێزپەڕەو لە قسەی زانایانو بە بۆچوونی من قسەیەكی هەڵەیە، دەڵێ: {(المسألة الخامسة: في أنَّ العِلمَ بالسِّحرِ غيرُ قبيح ولاَ مَحظُورٌ، اتفَقَ المحَقِّقُون عَلَى ذَلِكَ، لأنَّ العِلمَ لِذاتهِ شَريفٌ و أيضاً لِعمومِ قولِه تعالى: ﴿ ... قُلْ هَلْ يَسْتَوِي ٱلَّذِينَ يَعْلَمُونَ وَٱلَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ ... ﴿٩﴾ ﴾الزمر، ولأنَّ السِّحر لَو لَم يَكُن يُعلَمُ، لَما أمكَن الفَرقُ بَينَه وبَينَ المُعجِزِ، والعِلم بكون المعجِزِ معجِزاً وَاجِبٌ ومَا يَتوقَّفُ عَلَيهِ الوَاجب فَهُوَ وَاجِبٌ، وَمَا يكون واجِباً كَيفَ يَكُون حَرَاماً قَبِيحاً؟!)[1]}، واتە: زانیاری بە جادوو (واتە: كە تۆ جادوو بزانی) نە خراپە نە حەرامیشە، زانایانی لێكۆڵەرەوە لەسەر ئەوە یەك دەنگن {كە لێرەدا بەڕاستی نەیپێكاوە، چونكە زانایانی لێكۆڵەرەوە لەسەر عەكسی ئەوە ڕێككەوتون، ئنجا بەڵگەكەی ئەوەیە كە دەڵێ:} عیلم لە خودی خۆیدا شتێكی باشە، وە چونكە خوا بەگشتی فەرموویەتی: ئایا ئەوانەی دەزانن‌و ئەوانەی نازانن یەكسانن؟! وە لەبەر ئەوەش كە ئەگەر خەڵك عیلمی جادوو نەزانن، ئەو كاتە خەڵك موعجیزەو جادوو تێكەڵ دەكەن‌و زانینی موعجیزەش فەرزە، كەواتە: زانینی جادووش فەرزە، بۆ ئەوەی كە موعجیزەی پێغەمبەرانی پێبزانین‌و پێی جیا بكەینەوە لە جادووی جادووگەران.

بەڵام لە ڕاستیدا بەڵگەكانی بێهێزن، چونكە زانین‌و، جیاكردنەوەی موعجیزەی پێغەمبەران لەگەڵ جادووی جادووگەران، پەكی لەسەر ئەوە نەكەوتوە كە ئینسان جادوو بزانێ، بەڵام من پێشتر شتێكم گوت كە دروستە تۆ كتێبی جادووگەران بخوێنیەوە، بەڵام فێربوونی جادوو بەمەرجێ دروستە كە فێربوونی جادووەكە بۆخۆی گوناح، یان كوفر نەبێت، چونكە جاری وایە

---

١) بڕوانە: (التفسير الكبير، ج (٢)، ص (١٩٤)) .

کابرا ناتوانێ جادوو فێربێ، تا کافر نەبێت ! بۆ وێنە: دەستنوێژی بە میز پێ هەڵدەگرن، کوفری پێدەکەن، ئەوجار فێری جادوو دەبێ، دیارە ئەوەش کوفرە، ئنجا زانایان هەموویان کەمو زۆر کتێبی (سحر)یان خوێندۆتەوە، بۆیە باسی دەکەن (سحر) ئاوایەو ئەوەندە جۆرەی هەیە، دیارە کتێبەکانیان خوێندۆتەوە، ئەگەرنا چۆن لەبارەیەوە دەدوێن؟ وە لەوانەیە (إمام فخرالدین الرازي) هەر مەبەستی ئەوە بووبێت، کە دروستە تۆ بزانی جادوو چییەو جادووگەران چۆنن‌و جادوو چۆن دەکرێ؟ بەڵام بەرەهایی فێربوونی‌و خەڵك فێرکردنی، ئەوە حەرامەو جاری واش هەیە کوفرە بەدڵنیایی.

## خاڵی نۆیەم: چۆنیەتی خۆپاراستن لە جادوو وە چارەسەری جادوو؟

خۆ پاراستنەکەی زانایان باسیان کردوە، کە تاکە ڕێبازی خۆ پاراستن لە جادوو بریتیە لە بەندایەتی ڕاستەقینە بۆ خواو ئیمانی چاك‌و تەقوای چاك، وە زۆر قورئان خوێندن‌و بەردەوام بوون لەسەر زیکرو ویردو دووعایەکان کە پێغەمبەر ﷺ داینـاون، بەتایبەتی دووعایەکانی بەیانیان‌و ئێواران، ئەوەش هەمووی چەندان ئایەت‌و فەرمایشتی پێغەمبەر ﷺ ئاماژەی پێدەکەن، بۆ وێنە خوا ﷻ لە سوورەتی (الأعراف)دا دەفەرموێ: ﴿ وَإِمَّا يَنزَغَنَّكَ مِنَ الشَّيْطَانِ نَزْغٌ فَاسْتَعِذْ بِاللَّهِ إِنَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿٢٠٠﴾ ﴾، واتە: وە هەرکات لە شەیتانەوە وەسوەسەیەکت بۆ هات، پەنا بەرە بەر خوا، بێگومان خوا بیسەری زانایە، کەواتە: هەمیشە پەنا بردنە بەر خوا، فێڵی شەیتان هەڵدەوەشێنێتەوە.

هەروەها دایکمان عائیشە خوا لێی ڕازی بێ فەرموویەتی: {(أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ إِذَا اشْتَكَى يَقْرَأُ عَلَى نَفْسِهِ بِالْمُعَوِّذَاتِ[1] وَيَنْفُثُ) (رَوَاهُ أَحْمَد بِرقم: (٢٤٧١٢)، وَالْبُخَارِيُّ بِرقم: (٥٠١٦)، وَمُسْلِم بِرقم: (٥٦٧٩)، وَأَبُو دَاوُدَ بِرقم:

---

١) مەبەست لە: (المعوّذات) هەرسێك سوورەتی: (الإخلاص، الفلق، الناس)ە، بڕوانە پەراوێزی: (رياض الصالحين) للنووي، ص (٤٧٦).

(٣٩٠٢)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٣٥٢٩)}، واتە: پێغەمبەر ﷺ كە نەخۆش دەبوو، یان حاڵەتی تەندروستی تێكدەچوو، سوورەتی (الإخلاص) و (الفلق)و سوورەتی (الناس) لەسەر خۆی دەخوێندەوە، وە فووشی بەخۆدا دەكرد (وە دەستی بە بەدەنی خۆیدا دەهێنا)[1]، ئنجا خوا ﷻ بۆی باسكردووین كە هەركەسێك ئەهلی تەقوابێ، خوا دەرووی خێری لێ دەكاتەوە، وە هەركەسێك ئەهلی تەقوابێ، فێڵو تەڵەكەی دوژمنانو ناحەزانو شەیتان كە گەورەترین دوژمنە، زەفەری پێ نابات، وەك دەفەرموێ: ﴿...وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يَجْعَل لَّهُۥ مَخْرَجًا ۝٢﴾ الطلاق، وە دەفەرموێ: ﴿...وَإِن تَصْبِرُوا۟ وَتَتَّقُوا۟ لَا يَضُرُّكُمْ كَيْدُهُمْ شَيْـًٔا ۝١٢٠﴾ آل عمران، وە خوا ﷻ بە شەیتانی فەرمووە: ﴿إِنَّ عِبَادِى لَيْسَ لَكَ عَلَيْهِمْ سُلْطَٰنٌ ۚ وَكَفَىٰ بِرَبِّكَ وَكِيلًا ۝٦٥﴾ الإسراء، واتە: بەندەكانی من تۆ دەستەڵاتت بەسەردا ناشكێن، واتە: نەدەستەڵاتت بەسەردا دەشكێن تووشی گوناهیان بكەی‌و، نە دەستەڵاتت بەسەردا دەشكێن كە بە جادوو كاریان تێ بكەی، وە خوا فەرموویەتی: ﴿...وَمَن يَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ فَهُوَ حَسْبُهُۥٓ ... ۝٣﴾ الطلاق، واتە: هەركەسێك بەڕاستی پشتی بەخوا ببەستێ خوای بەسە، هەروەها خۆ پاراستن لە گوناهو تاوانو تۆبەكردنو گەڕانەوە بۆ لای خوا، كاریگەریی زۆری هەیە بۆ پاراستن لەوە كە بكەوینە ژێر كاریگەریی جادووی جادووگەران، هەروەها قورئان خوێندن بەگشتی‌و بە تایبەت سوورەتی (البقرة)، كە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {(لاَ تَجْعَلُوا بُيُوتَكُمْ مَقَابِرَ فَإِنَّ الْبَيْتَ الَّذِي تُقْرَأُ فِيهِ سُورَةُ الْبَقَرَةِ لاَ يَدْخُلُهُ الشَّيْطَانُ) (رَوَاهُ أَحْمَد برقم: (٧٨٠٨)، وَمُسْلِم برقم: (١٨٢١)،

---

١) وەك لە فەرموودەی تیكەدا هاتوە، كە (بخاري ومسلم) گێڕاویانەتەوەو ئەمەش دەقەكەیەتی: (عن عائشة رضي الله عنها ان رسول الله ﷺ كان إذا أَخَذَ مَضْجَعَهُ، نَفَثَ في يَدَيْهِ، وقرأ بالمُعَوِّذات ومَسَحَ بهما جَسَدَهُ) البخاري: (٦٣١٩)، ومسلم: (٢١٩٢).

كەواتە: دیارە بەبێ نەخۆشییش هەموو شەوێ لەكاتی خەوتندا ئەو دووعایانەی هەر خوێندوون.

والتِّرمِذِيُّ برقم: (٢٨٧٧)، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ}، واته: ماڵەکانی خۆتان مەکەن بە گۆڕ، چونکە ئەو ماڵەی کە سووڕەتی بەقەڕەی تێدا دەخوێنلرێ شەیتانی ناچێتە نێو، شەیتان لێی ناچێتە ژوور.

هەروەها (آية الكُرسي) وەك لە (صحيح البخاري)دا هاتوە، لە بەسەرهاتێکدا... کە شەیتان قسەیەك بە (أَبو هُرَيرَةَ) دەڵێ ئەویش بۆ پێغەمبەری گێڕایەوە، ئەویش ﷺ فەرمووی: {(صَدَقَكَ وَهُوَ كَذُوبٌ) (رَوَاهُ البُخَارِي برقم: (٢٣١١)} واتە: ڕاستی لەگەڵ گوتووی هەرچەندە زۆر درۆزنیشە، قسەکەشی ئەوەیە کە بە (أَبو هُرَيرَةَ) دەڵێ: هەر کاتێ شەو چوویە سەر جێگا (آية الكُرسي) بخوێنە هەتا تەواوی دەکەی، هەتا ڕۆژ دەکەیەوە پارێزەرێکت لەلا دەبێت، وە شەیتان تا بەیانی ناتوانێ نزیکت بکەوێ. ئنجا خوێندنی دوو ئایەتی کۆتایی سووڕەتی (البقرة) کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {(مَنْ قَرَأَ بالآيَتَيْنِ مِنْ آخرِ سُورَةِ البَقَرَةِ فِي لَيْلَةٍ كَفَتَاهُ) (رَوَاهُ أَحْمَد برقم: (١٧٠٣٣)، وَالبُخَارِيُّ برقم: (٥٠٠٩)، وَمُسْلِم برقم: (١٨٧٧)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (١٣٩٧)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٢٨٨١)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (١٣٦٩)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٧٨١) عَنْ أَبي مَسْعُودٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ}، واته: هەرکەسێك دوو ئایەتی کۆتایی سووڕەتی بەقەڕە لە شەوێدا بخوێنێتەوە بەسیەتی. (واتە: بەسیەتی بۆ ئەوەی پارێزراو سەلامەت بێ).

چارەسەری جادووش بەو دووعایانە دەبێ، کە بۆ ئەو مەبەستە دانراون، وە بەوە دەبێ کە جادووەکە هەڵبوەشێنرێتەوە، کە ئەوە تەفصیلی زۆری دەوێ تا باسی دەکەین، وە لە (صحيح البخاري)دا هاتوە کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: هەر کەسێ بەیانیان حەوت دنکە خورما بخوات، {بەتایبەتی جۆری (عجوة)} ئەوە ئەو ڕۆژە تا ئێوارە نە ژەهرو نە جادوو کاری تێ ناکەت.

## خاڵی دەیەم: سزای جادووگەر، ئایا کەسێك کە کاری جادووگەریی دەکات، چ سزایەکی بۆ دانراوە؟

دیارە سزای جادووگەریی یەکێك نیە لەو سزا شەرعییانەی کە دیاری کراون، واتە: یەکێك نیە لە (حدود)ی شەرعیی، بۆیە زانایان تێیدا کەوتوونەتە مشتومڕەوەو، زۆریان ڕایان وابووە، کە جادووگەر ئەگەر جادووەکەی کوفری تێدابێ، وە ببێتە هۆی کوشتنی خەڵکی دەبێ بکوژرێ، وە هەندێکیان گوتوویانە: بەس دەبێ سزا بدرێ، بەڵام من پێم وایە، ئەوە کە جادووگەر چۆن مامەڵەی لەگەڵدا بکرێو چۆن سزا بدرێ ؟ لە سنووری دەستەڵاتی حوکمڕانی شەرعییو لە بازنەی سیاسەتی شەرعیی دایە، نەك یەکێك بێ لە سزا شەرعییەکان، حیکمەتەکەیشی دیارە: چونکە جادوو یەك شتی دیاریکراو نیە، بۆیە حوکمڕانی مسوڵمانان مامەڵە لەگەڵ جادووگەراندا دەکات، بەپێی جۆری جادووەکەیان، خوا بە لوتفو کەرەمی خۆی لە جادووی جادووگەران بمانپارێزێ، وە بمانکات بە خاوەنی ئیمانو عەقیدەو عیبادەتێکی وا کە لەسایەی بەندایەتییمان بۆ خوا شەیتانی ئینسو جن زەفەرمان پێنەبەن، نە بە شێوەی ڕواڵەت نە بە شێوەی پەنامەکیی.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی بیست و یەکەم

## پێناسـەی ئەم دەرسـە

لەم دەرسەماندا خوا پشتیوان بێ، ئایەتەکانی: (١٠٤ تاکو ١١٠) لە سوورەتی (البقرة) تەفسیر دەکەین، واتە: حەوت ئایەت، لەم حەوت ئایەتەدا بۆ یەکەم جار لە سوورەتی (البقرة)دا خوا ﷻ بە شۆرەتو نازناوی (ئیمان) مسوڵمانان دەدوێنێ: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ﴾، ئەوە یەکەم جارە لەسەرەتای سوورەتی (البقرة) وە تا ئێستا، وە لە هەموو قورئاندا (٨٨) جار ڕستەی: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ﴾، دووبارە بۆتەوە، وە لەم حەوت ئایەتانەدا، خوا ﷻ کۆمەڵێك ڕێنمایی ئاڕاستەی مسوڵمانان دەکات، یەکێك لەوانە ئەوەیە کە خۆیان لە بەکارهێنانی هەندێك تەعبیرو وشە بپارێزن، کە مانای خراپیان هەبێت، یاخود دوژمنانو ناحەزان بیانقۆزنەوەو بەخراپ بەهرەیان لێوەرگرن، وە دەربارەی خاوەن کتێبەکان بەتایبەت جوولەکەو نەصرانیی یەکان هەندێك ڕێنمایی مسوڵمانان دەکات، کە چۆن مامەڵەیان لەگەڵدا بکەن، وە چۆن خۆیان لە هەڵوێستو هەڵەکانی ئەوان بپارێزن .

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَقُولُوا۟ رَٰعِنَا وَقُولُوا۟ ٱنظُرْنَا وَٱسْمَعُوا۟ ۗ وَلِلْكَـٰفِرِينَ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿١٠٤﴾ مَّا يَوَدُّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِنْ أَهْلِ ٱلْكِتَـٰبِ وَلَا ٱلْمُشْرِكِينَ أَن يُنَزَّلَ عَلَيْكُم مِّنْ خَيْرٍ مِّن رَّبِّكُمْ ۗ وَٱللَّهُ يَخْتَصُّ بِرَحْمَتِهِۦ مَن يَشَآءُ ۚ وَٱللَّهُ ذُو ٱلْفَضْلِ ٱلْعَظِيمِ ﴿١٠٥﴾ ۞ مَا نَنسَخْ مِنْ ءَايَةٍ أَوْ نُنسِهَا نَأْتِ بِخَيْرٍ مِّنْهَآ أَوْ مِثْلِهَآ ۗ أَلَمْ تَعْلَمْ أَنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿١٠٦﴾ أَلَمْ تَعْلَمْ أَنَّ ٱللَّهَ لَهُۥ مُلْكُ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۗ وَمَا لَكُم مِّن

دُونِ ٱللَّهِ مِن وَلِيٍّ وَلَا نَصِيرٍ ﴿١٠٧﴾ أَمْ تُرِيدُونَ أَن تَسْـَٔلُوا۟ رَسُولَكُمْ كَمَا سُئِلَ مُوسَىٰ مِن قَبْلُ ۗ وَمَن يَتَبَدَّلِ ٱلْكُفْرَ بِٱلْإِيمَٰنِ فَقَدْ ضَلَّ سَوَآءَ ٱلسَّبِيلِ ﴿١٠٨﴾ وَدَّ كَثِيرٌ مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ لَوْ يَرُدُّونَكُم مِّنۢ بَعْدِ إِيمَٰنِكُمْ كُفَّارًا حَسَدًا مِّنْ عِندِ أَنفُسِهِم مِّنۢ بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمُ ٱلْحَقُّ ۖ فَٱعْفُوا۟ وَٱصْفَحُوا۟ حَتَّىٰ يَأْتِىَ ٱللَّهُ بِأَمْرِهِۦٓ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿١٠٩﴾ وَأَقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُوا۟ ٱلزَّكَوٰةَ ۚ وَمَا تُقَدِّمُوا۟ لِأَنفُسِكُم مِّنْ خَيْرٍ تَجِدُوهُ عِندَ ٱللَّهِ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴿١١٠﴾ ﴾

## مانای وشە بە وشەی ئایەتەکان

((ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە (لەکاتی قسەکردن لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ) مەڵێن: (رَاعِنَا) (واتە: چاودێریمان بکە) بەڵکو بڵێن: (أُنظرنا) (واتە: چاوەڕێمان بکە) وە گوێبیستو فەرمانبەربن، وە بۆ بێبڕوایان ئازارێکی بەئێش‌و ژان هەیە ﴿١٠٤﴾ بێگومان ئەوانەی بێبڕوان لە خاوەن کتێبەکان‌و هاوبەش بۆ خوا دانەران، حەزناکەن هیچ چاکەو نیعمەتێك لە پەروەردگارتانەوە دابەزێتە سەرتان، بەڵام خوا بەزەیی خۆی تایبەت دەکات بە هەر کەسێکەوە کە حەز بکات، وە خوا خاوەن بەخششی مەزنە ﴿١٠٥﴾ هەر ئایەتێك (یان موعجیزەیەك) لابەرین یان لەبیربەرینەوە بێگومان هی چاکتر لەو یان وەك وی دێنین، ئایا نازانی کە خوا لەسەر هەموو شتێك بەتوانایە ! ﴿١٠٦﴾ ئایا نازانی کە موڵکی ئاسمانەکان‌و زەوی هی خوایە، وە جگە لەو هیچ سەرپەرشتیارو پشتیوانێکتان نیە ! یاخود (ئەی مسوڵمانەکان !) ﴿١٠٧﴾ دەتانەوێ کە هەمان شت لە پێغەمبەرەکەتان بخوازن کە پێشتر لە مووسا داواکرا ! وە هەرکەسێك ئیمان بە کوفر بگۆڕێتەوە، ئەوە رێی راستی ون کردوە ﴿١٠٨﴾ زۆرێك لە خاوەن کتێبەکان بە هۆی حەسوودیی‌یەکەوە کە لە دەروونیاندایە، پاش ئەوەی کە هەقیان بۆ روون بۆتەوە، پێیان خۆشە کە لەدوای ئیمان هێنان، هەڵتانبگێڕنەوەو کافرتان

بكەنەوە، دە جا هەتا خوا كاری خۆی دەكات، لێیان ببوورن‌و چاوپۆشییان لێبكەن، بێگومان خوا لەسەر هەموو شتێك توانایە ﴿١٠٩﴾ وە نوێژ بەرپا بكەن‌و زەكات بدەن، وە دڵنیابن كە هەرشتێك لە چاكە بۆ خۆتان پێش بخەن، ئەوە لەلای خوا دەیبیننەوە، وە بێگومان خوا بینەری هەرچییەكە كە دەیكەن﴿١١٠﴾)).

## شیكردنەوەی هەندێك لە وشەكان

(رَٰعِنَا ): لە زمانی عارەبییدا دەگوترێ: (رَعَيتُهُ: حَفِظتُهُ)، واتە: چاودێرییم كرد: پاراستم. (والمُرَاعَاة: المُرَاقَبَة) (مُرَاعَاة)، واتە: چاودێریی كردن‌و ئاگالێبوونە، وە خوا دەربارەی نەصرانیی یەكان دەفەرموێ: ﴿...فَمَا رَعَوۡهَا حَقَّ رِعَايَتِهَا...﴿٢٧﴾﴾الحديد، واتە: ئەو ڕەهبانییەتەی كە دایانهێنا، دوایی وەك پێویست چاودێرییان نەكردو ئاگایان لێنەبوو.

(ٱنظُرۡنَا ): (النَّظَرُ: الإنظار، يُقَالُ: نَظَرتُ وَانتظَرتُ وَأَنظَرَتُ) هەرسێكی بەمانای چاودێریی كردن دێ، وە (أَنظَرتُهُ): بە مانای: (أَخَّرتُهُ) دێت، واتە: دوام خست، ئەهها ئیبلیس كە لە خوا پاڕایەوە، گوتی: ﴿ قَالَ أَنظِرۡنِيٓ إِلَىٰ يَوۡمِ يُبۡعَثُونَ ﴿١٤﴾﴾الأعراف، واتە: دوامبخەو بمهێڵەوە تا ڕۆژی قیامەت.

(وَٱسۡمَعُواْ ): واتە: ببیستن. بەڵام لێرەدا، یانی: تێبگەن‌و فەرمانبەریی بكەن‌و جێبەجێی بكەن.

(يَوَدُّ ): (الوُدُّ: مَحَبَةُ الشَّيءِ وَتمَنِّي كَونِهِ)، (وُدّ) ئەوەیە ئینسان شتێكی خۆشبوێ‌و خۆزگە بخوازێ ئەو شتەی بۆ ببێ.

(خَيۡرٍ ): (الخَيْرُ: مَا يَرغَبُ فيهِ الكُل، وَالشَّيءُ النّافِع، وضِدُّهُ الشَرُّ) وشەی (خَيْر) كە لە قورئاندا بەكارهاتوە، هەروەها لە زمانی عارەبیدا، بەگشتی هەرشتێكە هەموو كەس ئارەزووی دەكات‌و پێی چاكە، وە بە هەرشتێكی سوودبەخش

دەگوترێ‌و پێچەوانەی باشە (خَيْر)، بریتیە لە خراپە (الشَّـر).

(يَخْتَصُّ ): واتە: تایبەت دەكـات.

(بِرَحْـمَتِهِۦ ): (الرَّحْمَة: رِقّة تَقتَضي الإحْسَان إلـى الـمَرْحُومِ)، واتە: بریتیە لە دڵ نەرمییەك کە وا دەخوازێ چاكە لەگەڵ ئەو کەسەدا بكرێ، کە بەزەیی لەگەڵ نوێنراوە، بەڵام بەنسبەت خوای بەبەزەیی کە وشەی (الرَّحْمَـة) بەكاردێت، واتە: چاكەكردنی خوا لەگەڵ ئەو کەسانەی کە بەزەیی پێیان دا دێ.

(نَنسَخۡ ): (النَّسْخُ: إزَالَة شَيءٍ بِشَيءٍ يَتَعَقبُهُ كَنَسْخِ الشَّمْسِ الظِّـلَ)، (نَّسخُ) بریتیە لەوەی شتێك شتێك لابەرێ‌و بەدوای دا بێ، وەك چۆن ڕۆژ سێبەر یان تاریكی لادەبا.

(ءَايَةٍ ): بەمانای ڕستەی قورئانی دێ‌و، لە ئەسڵدا بەمانای نیشانە (عَلاَمَة)یە، لەبەر ئەوەی هەر كام لە ڕستەكانی قورئان نیشانەن لەسەر پەروەردگاریێتی‌و لەسەر گەورەیی‌و بەرزیی خوا، هەروەك چۆن دیاردە سروشتییەكانیش ناونراون (آیـة)، وە موعجیزەی پێغەمبەرانیش (علیهم الصلاة والسلام) پێی دەگوترێ (آیـة)، چونكە موعجیزەی پێغەمبەرانیش نیشانەیە لەسەر ئەوە، كە ئەو پێغەمبەرانە لەلایەن خواوە ڕەوانە كراون، وە دیاردە سروشتییەكانیش كە خوا ناوی لێناون (آیـات)، هەركامێكیان نیشانەو بەڵگەیە لەسەر خاوەنەكەی، كە خوای پەروەردگارە.

(نُنسِهَا ): واتـە: لەبیری دەبەینەوە، وە خوێنراویشەتەوە: (نُنْسِأْهَا)، واتـە: دوای دەخەین.

(وَلِيٍّ ): (الوِلاَيَة: تَوَلّي الأَمرِ، والوَلاَيَة النُّصْرَة)، كەواتە: (وليّ) بە دوو مانا دێ، یان بە مانای سەرپەرشتیار دێت، كە كەسێك ئیشێك بە ئەستۆوە دەگرێ، یان بەمانای یارمەتیدەر دێ.

(**نَصِيرٍ**): واتـه: (مُعيـن)، یارمەتیـدەر.

(**يَتَبَدَّلِ**): (الإبدَال والتبـدِيل والتَبَّدُلُ والإستبدَال جَعْلُ الشَّيءِ مَكَـان آخـر) ئەوەیە كە شتێك لە شوێنی شتێك دابنرێ، كەواتە: (يَتَبَدَّل) واتە: بیگۆڕێ.

(**سَوَآءَ ٱلسَّبِيلِ**): واتـە: ڕێـی ڕاسـت، چونكە وشـەی: (سـوآءَ) بـەمانای ڕێكیـیو تەختـی دێ: (مَكَـان سـويٌ وَسـواء يَعنـي: وَسـط) واتـە: ڕێیـەكی ڕاسـتی بـێ گـرێو گـۆڵ.

(**يَرُدُّونَكُم**): واتە: هەڵـتان دەگـێڕنەوە (دەتانگـێڕنەوە).

(**حَسَدًا**): لە كوردەوارییدا بـە (ئێـرەی) مانـا كـراوە، دەڵێن: ئێرەیـی پـێ دەبا، وە وشـەی: (حَسـد) زانایانی ئیسلام ئاوایـان پێناسـە كـردوە، دەڵێن: (تمَنِّـي زَوَالِ نِعمَةٍ عَنْ مُستحَقٍّ لَهَـا) بەخۆزگـە بخوازی نیعمەتێك لەسـەر كەسێك لابچێ كە شایسـتەیەتی، (غِبْطَـة)ش هەیـە ئـەویش ئەوەیـە كـە تـۆ پێت خۆشـبێ تۆش وەك ئەوت هەبێ، كە ئەوە حەڕام نیە، وە كـە پێغەمبـەر ﷺ لـەوبارەوە فەرموویەتی: {(لاَ حَسـد إلاَّ فـي اثْنَتَيْنِ: رَجُـلٌ آتَـاهُ اللهُ مَـالاً، فَسَـلَّطَهُ عَلَـى هَلَكَـتِهِ فـي الحَـقِّ، وَرَجُـلٌ آتَـاهُ اللهُ الحِكْمَـةَ، فَهُـوَ يَقْضِي بِهَـا وَيُعَـلِّمُهَا) (رَوَاهُ البُخَـارِيُّ برقم: (٧٣)، وَمُسْلِم برقم: (١٨٩٣)، وَابْنُ مَاجَهْ بـرقم: (٤٢٠٨)، عَنْ عَبْدَ اللهِ بنَ مَسْعُودٍ رضي الله عنه} لێرەدا مەبەست لە (حَسـد) (غِبْطَـة)یە.

(**فَٱعْفُواْ**): (العَفو: تَرْكُ العُقُوبَة) واتـە: سزا نەدان، لـێبوردن.

(**وَٱصْفَحُواْ**): واتـە: چاوپۆشـیی لێكـردن، (عَفـو) ئەوەیە كە لە كەسێك ببووریو سـزای نـەدەی، بـەڵام (صَفْح) ئەوەیـە كـە چاوپۆشـیی لـێ بكـەیو تەنانـەت لۆمـەو سـەركۆنەشـی نەكـەی.

## هـۆی هاتنە خـوارەوەی ئایەتەكـان

هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ڕستە قورئانییەی كـە دەفـەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَقُولُواْ رَٰعِنَا وَقُولُواْ ٱنظُرۡنَا وَٱسۡمَعُواْۗ وَلِلۡكَٰفِرِينَ عَذَابٌ أَلِيمٞ ﴾، {(روى أَبُو نُعَيم عَن ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ الله عَنْهُمَا قَالَ: (رَاعِنَا) بِلِسَانِ اليَّهُود السَّبُّ القَبِيحُ وكَانَ اليَّهُود يَقُولُونَ ذَلِكَ لِرَسُول اللهِ ﷺ سراً فلَمَّا سَمِعُوا أصحَابهُ يَقُولُونَ ذَلِكَ، اعلنوا بِهَا فكَانوا يَقُولُونَ ذَلِكَ وَيَضحَكُونَ فِيمَا بَينهُم، فَأَنزَلَ الله هَذِهِ الآيَة) (فتح القدير، ج (١)، ص (١٧١)، أسباب النزول للنيسابوري، ص (٢٤)}، واتـە: عەبدوڵـڵای كوڕی عـەبباس خـوا لـە خـۆیو بـابی ڕازی بـێ، دەفـەرموێ: بـە زمـانی جوولـەكان وشـەی (رَاعِنَا) جنێوێكـی زۆر ناشیرینە، جا جوولەكەكان ئەوەیان بە پەنهانیی بە پێغەمبەر دەگـوت ﷺ بـەڵام كاتێك گوێیـان لە هەندێك لە هاوەڵانی پێغەمبەر بـوو ﷺ كە ئـەوان بـە دڵـێكی سـافەوە ئەوەیان بەكاردەهێنـا، {دەیانگوت: (یارسـول الله راعنا) ئەی پێغەمبەری خوا چاودێریمان بكـە، ئاگـات لێمان بـێ !، بـە زمـانی جوولەكەكانیش: (رَاعِنَا) هەندێكیان دەڵێن گوتوویانە: (رَاعِنَا) (ی)یان بۆ زیاد كـردوە، (رَاعِینا) واتـە: تۆ شـوانو گـاوانی ئێمەی ! وە هەندێك دەڵێن: (رَاعِنَا) لە (أرعن)ەوە هاتوە، واتە: ئینسانی بێ عەقـڵ} لەوەودوا ئەوانیش بەدەنگی بەرز جاری وا هەبوو دەیانگـوت (یا محمد رَاعِنَا)، وە لە بەینی خۆشیاندا پێدەكـەنین، {چونكە دەیانزانی ئـەوە لەلای ئەوان مانایەكـی خراپی هەیە}، بۆیە خـوا ئەم ئایەتەی نارده خوارەوە،

وە سـەرەنجام خـوا ﷻ لـە مـسوڵمانانی قەدەغـە كـرد، كـە ئـەم وشـەیە بەكـاربێنن‌و، پێی فەرموون: لەجیـاتی ئـەو وشـەیە بڵـێن: (أُنظُرنَا) كە هەمان مانـای (رَاعِنَا)ی هەیـە، واتـە: چـاوەڕێمان بكـە، چـاودێریمان بكـە، بـەڵام ڕێـی فامرانەوەی ئەو مەبەستە خراپەی نیـە.

## مانـــای گشـــتی ئایەتەکـــان

خوا ﷻ لێرەدا بۆ یەکەم جار لە سوورەتی (البقرة)دا ئیمانداران بەو ناوە دەدوێنێ: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ﴾، ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە! کە دیارە بە پلەی یەکەم پێغەمبەری ﷺ گرتۆتەوە، بەڵام دوایی هەموو کۆمەڵگای مسوڵمان پاشان هەموو ئەو مسوڵمانانە دەگرێتەوە، کە لەبازنەی ئیماندا خۆیان دەبیننەوە شایانی باسیشە کە لە قورئاندا (٨٨) جار ڕستەی: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ﴾، دووبارە بۆتەوە کە ئەوە یەکەمین جاریانە بەپێی ڕیزبەندیی سوورەتەکان لە (مصحف)دا نەك بەپێی هاتنە خوارەوەیان، کە ڕەنگە هەندێك لە ئایەتەکانی دیکە کە: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ﴾، تێدایە لە پێش ئەم ئایەتەدا هاتبنە خوارێ، خوا دەفەرموێ: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَقُولُوا۟ رَٰعِنَا وَقُولُوا۟ ٱنظُرْنَا وَٱسْمَعُوا۟ ۗ وَلِلْكَـٰفِرِينَ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴾، ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە! مەڵێن: (رَٰعِنَا )، واتە: کاتێك لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ قسە دەکەن، ئەو تەعبیرە بەکارمەهێنن، بەڵکو بڵێن: (ٱنظُرْنَا ) واتە: چاودێریمان بکە، (وَٱسْمَعُوا۟ ) وە ئەوەی پێتان دەگوترێ وەریبگرنو بیبیستنو جێبەجێی بکەن، وە بۆ بێبڕوایان ئازارێکی بە ئێشو ژان هەیە، ئەو بێبڕوایانەی کە ئەم جۆرە تەعبیرانە بەکاردەهێنن کە ڕواڵەتەکەیان مانایەکی باشی هەیە، بەڵام مەبەستیان پێ مانایەکی خراپە، بۆیە مسوڵمانان پێویستە خۆیان لە هەر تەعبیرێك، لە هەر وشەیەك بپارێزن، کە ئەهلی کوفر بیقۆزنەوە ماناکەی بە خراپ لێکبدەنەوە، ئنجا دەفەرموێ: ﴿ مَّا يَوَدُّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِنْ أَهْلِ ٱلْكِتَـٰبِ وَلَا ٱلْمُشْرِكِينَ أَن يُنَزَّلَ عَلَيْكُم مِّنْ خَيْرٍ مِّن رَّبِّكُمْ ﴾، ئەوانەی بێبڕوان لە خاوەن کتێبەکان، وە لە هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان، حەزناکەن هیچ خێرو چاکەیەك بۆ ئێوە بێتە خوار لە پەروەردگارتانەوە ﴿ وَٱللَّهُ يَخْتَصُّ بِرَحْمَتِهِۦ مَن يَشَآءُ ﴾، بەڵام بێگومان خوا ﷻ

بە دڵی پیسی ئەوانو بەخۆزگەو ئاواتی خراپی ئەوان ناكاتو تایبەت دەكا بە بەزەیی خۆیەوە، هەركام لە بەندەكانی كە بیەوێ ﴿وَٱللَّهُ ذُو ٱلْفَضْلِ ٱلْعَظِيمِ ﴾، وە بێگومان خوا خاوەنی بەزەییو بەخششی مەزنە، ئنجا دێتە سەرباسی مەسەلەیەك كە ئەو كاتە باوبووەو لەنێو مسوڵماناندا مشتومڕی لەسەر بووە، كە چۆن خوا ﷻ هەندێك لە ئایەتەكان دەنێرێو دوایی (نَسْخ)یان دەكاتەوەو لایان دەبات؟ یاخود جوولەكەكان ڕەخنەیان گرتووەو گوتوویانە: چۆن خوا ﷻ بە شەریعەتی ئیسلامیی، شەریعەتی مووساو شەریعەتی پێغەمبەرانی پێش موحەممەد ﷺ (نَسْخ) دەكاتەوەو لادەبات؟ بۆیە دەفەرموێ: ﴿مَا نَنسَخْ مِنْ ءَايَةٍ أَوْ نُنسِهَا نَأْتِ بِخَيْرٍ مِّنْهَآ أَوْ مِثْلِهَآ ﴾، هیچ ئایەتێك لانابەین یاخود لەبیری نابەینەوە، حەتمەن یەكێكی لەو چاكتر یان وەك ئەو دێنین، واتە: لەو چاكتر بۆ ئێوە، ئەگەرنا ئایەتەكانی خوا هەموویان چاكن، بەڵام بۆ ئێوە كە پاداشتی لەو زیاتری تێدابێ، ئەگەر كاری پێبكەن، یاخود وەك ئەوبێو بەقەدەر ئەو پاداشتی هەبێ ﴿أَلَمْ تَعْلَمْ أَنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴾، ئایا نازانی خوا لەسەر هەموو شتێك بەتوانایە ! لێرەدا هەندێك دەڵێن: كاتێ جوولەكەكان ڕەخنەیان گرتوە: چۆن دەبێت شەریعەتێكی خوا بێتو شەریعەتێكی دی لابەرێ ؟! خوا ﷻ ئەم ئایەتەی ناردۆتە خوارێ، كە ئێمە وەختێ شەریعەتێك لادەبەین یەكێكی دی لەو چاكتر دێنین، واتە: لەو چاكتر دێنین بۆ مرۆڤایەتی لەو قۆناغەدا كە ئەو شەریعەتەی دوایی تێدادێ، یاخود وەك وی دێنین، ئەوە لەلایەك.

وە هەندێك دەڵێن: جوولەكەكان دەیانگووت: بۆچی موحەممەد ﷺ موعجیزەی وەك مووساو عیسای نیە ؟! وەك پێشتر باسمكرد كە گوتیان: موحەممەد موعجیزەی بۆ نەهاتوە، خوا فەرمووی: ﴿ وَلَقَدْ أَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ءَايَٰتٍۭ بَيِّنَٰتٍ ﴾، جا لێرەدا هەندێك دەڵێن: وشەی: ﴿ ءَايَٰتٍ ﴾، لێرەدا بەمانای موعجیزەیە، واتە: موعجیزەو بەڵگەو نیشانە لەسەر ڕاستێتی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام)، جا خوا دەفەرموێ: ئەو موعجیزانەی پێغەمبەرانی پێشوومان كە لابردوون، یاخود

لەبیرمان بردوونەوەو، ئەوەندەیان زەمان بەسەردا ڕۆیشتوە خەڵك لەبیری بچنەوە، یاخود لەبیرمان بردوونەوە، ئێستاکە ئەوانە بۆ پێغەمبەری کۆتایی نانێرین ئەوە بەڵگەو موعجیزەی دیکەمان بۆ ناردوە، کە قورئانە، وە خوا ﷻ لەسەر هەموو شتێك بەتوانایەو، خوا خاوەنی ئەم کەون و کائیناتەیەو خاوەنی خەڵکە، خۆی چۆنی پێ چاك بێ و حیکمەتی بیخوازێ وا دەکا، کەواتە: وشەی ﴿ ءَايَـٰتٍ ﴾ دەکرێ مەبەست پێی ڕستەکانی قورئان بێت و، دەشگونجێ مەبەست پێی ئایەتەکانی شەریعەتەکانی پێشووبێ، وە دەشگونجێ مەبەست پێی موعجیزەو بەڵگەی پێغەمبەرایەتی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) بێ، جا دەفەرموێ: ﴿ أَلَمْ تَعْلَمْ أَنَّ ٱللَّهَ لَهُۥ مُلْكُ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ﴾، ئایا نازانی موڵکی ئاسمانەکان و زەوی هەمووو هی خوایە ﴿ وَمَا لَكُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ مِن وَلِىٍّ وَلَا نَصِيرٍ ﴾، وە جگە لە خوا هیچ سەرپەرشتیارو دۆست و هیچ یارمەتیدەرێکتان نیە ؟! ﴿ أَمْ تُرِيدُونَ أَن تَسْـَٔلُوا۟ رَسُولَكُمْ كَمَا سُئِلَ مُوسَىٰ مِن قَبْلُ ﴾، خوا ﷻ بەجۆرێك لە گلەیی و سەرزەنشتەوە بە مسوڵمانان دەفەرموێ: یاخود دەتانەوێ داوا لە پێغەمبەری خۆتان بکەن، وەك چۆن پێشتر لە مووسا داواکراوە، واتە: مووسا داوای بێ جێی لێکراون، بۆ وێنە: جوولەکەکان داوایان لێکرد کە خوا ببینن: ﴿ وَإِذْ قُلْتُمْ يَـٰمُوسَىٰ لَن نُّؤْمِنَ لَكَ حَتَّىٰ نَرَى ٱللَّهَ جَهْرَةً ...﴿٥٥﴾ ﴾ البقرة، وە یادبکەنەوە کاتێك گوتتان: ئەی مووسا ئیمانت بۆ ناهێنین هەتا خوا بە ئاشکرا نەبینین ! وە زۆر بڕو بیانووی دیکەیان بە مووسا ﷺ دەگرتن. ئنجا خوا ﷻ لێرە بە مسوڵمانان دەفەرموێ: ئایا هەر لەبەرئەوەی جوولەکەکان دەڵێن: پێغەمبەری کۆتایی موحەممەد ﷺ موعجیزەی وەك هی مووساو عیسای نیە، ئێوەش داوا لە پێغەمبەری خۆتان دەکەن کە موعجیزەی وەك هی وان بێنێ و شتێك داوا لە پێغەمبەری خۆتان دەکەن کە پێشتر لە مووسا داواکراوە ! واتە: ئەگەر ئەوان بیانوویان بە پێغەمبەری خۆیان گرتوە، ئێوە بیانوو بە پێغەمبەری خۆتان مەگرن ﴿ وَمَن يَتَبَدَّلِ ٱلْكُفْرَ بِٱلْإِيمَـٰنِ فَقَدْ ضَلَّ سَوَآءَ ٱلسَّبِيلِ ﴾، وە هەر کەسێکیش ئیمان بە کوفر بگۆڕێتەوە، ئەوە

ڕێی ڕاستی ون کردوە، واتە: هەرکەسێك بەو موعجیزەیە قەناعەت نەکات، کە خوا داویەتی بەو پێغەمبەرەی سەردەمی خۆی، مانای وایە کوفری پێ دەکات، کەواتە: ئەوکاتە ئیمانی بە کوفر گۆڕیوەتەوە، یاخود هەرکەسێك ڕەخنە بگرێ لە خوا، لەبەر ئەوەی ئایەتێك لادەباو ئایەتێکی دیکە لە شوێنی دادەنێ، ئەوە پێی کافر دەبێت، چونکە ڕەخنە لە خوا گرتن کوفرە، کەواتە: ئیمانی بە کوفر گۆڕیوەتەوە، کەسێکی واش دیارە ڕێی ڕاستی بزر کردوە. ئنجا دێتە سەر باسی هەڵوێستێکی دیکەی جوولەکەکانو خاوەن کتێبەکان بەگشتیو دەفەرموێ: ﴿ وَدَّ كَثِيرٌ مِّنْ أَهْلِ الْكِتَابِ لَوْ يَرُدُّونَكُم مِّن بَعْدِ إِيمَانِكُمْ كُفَّارًا حَسَدًا مِّنْ عِندِ أَنفُسِهِم مِّن بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمُ الْحَقُّ ﴾، زۆرێك لە خاوەن کتێبەکان بە ئاوات دەخوازنو حەزدەکەن، کە ئێوە لەدوای ئەوەی ئیمانتان هێناوە، هەڵتانبگێڕنەوەو کافرتان بکەنەوە بەهۆی ئەو حەسوودییەی لەدڵیاندا هەیە، دوای ئەوەی حەقیشیان بۆ ڕوونبۆتەوە، یانی: بۆیان ڕوونبۆتەوە ئەو بەرنامەیەی، کە بۆ پێغەمبەری کۆتایی هاتوە هەقە، لەگەڵ ئەوەشدا بە ئاوات دەخوازن وەك چۆن بۆ خۆیان کافرن، ئێوەش کافر بکەنەوە ﴿ فَاعْفُوا وَاصْفَحُوا حَتَّىٰ يَأْتِيَ اللَّهُ بِأَمْرِهِ ﴾، بەڵام ئێوە لێیان ببوورنو چاوپۆشییان لێبکەن هەتا خوا کاری خۆی تەواو دەکات، واتە: تا ئیسلام تەواو سەقامگیر دەبێو دەستەڵاتی خۆی قایم دەکات، ئەو کاتە مەجالی ئەو پیلانو فێڵەیان نامێنێو، ئەو بانگەشە خراپەیەی، کە دەیکەن کاریگەریی وای لەسەرتان نامێنێ ﴿ إِنَّ اللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴾، بێگومان خوا لەسەر هەموو شتێك بە توانایە، جا لە کۆتاییدا خوا ﷻ بە ئیمانداران دەفەرموێ: ﴿ وَأَقِيمُوا الصَّلَاةَ وَآتُوا الزَّكَاةَ ﴾، وە نوێژ بەرپابکەنو زەکات بدەن ﴿ وَمَا تُقَدِّمُوا لِأَنفُسِكُم مِّنْ خَيْرٍ تَجِدُوهُ عِندَ اللَّهِ ﴾، ئەوەش کە پێش دەستی خۆتانی دەخەن لەکاری چاکەو خێرو لە طاعەت، لەلای خوا دەیبیننەوە، واتە: پاداشتەکەی دەبیننەوە ﴿ إِنَّ اللَّهَ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴾، بێگومان خوا بە هەر چییەك کە دەیکەن ئاگادارەو دەیبینێ.

## چەنــد مەســەلەیـەكـی گرنــگ

**مەسـەلەی یەكەم:** مسـوڵمانان دەبێ خۆ بپارێزن لە هەر تەعبیـرێكو لـە هـەر وشـەیەك، یـان هـەر هەڵسوكەوتێك كـە ببێتـە هـۆی ئـەوە ئەهلـی كـوفر بیقۆزنـەوە، یان ئیشكالێكیان بۆ دروست بكات، یاخود زەمینـەیان بـۆ خـۆش بكات بۆ زیانـدان لـە ئیـسلامو مـسوڵمانان، وەك لـە (صـحیح)ی بوخـاریی دا هاتوە كە پێغەمبەر ﷺ بـە عائیـشەی فـەرمووە: {(یا عَائِشَـةُ لَـوْلاَ حَـدَاثـةُ قَوْمِـكِ بِالكُـفرِ، لَنَقَـضْتُ البَيْـتَ، ثُمَّ لَبَنَيـتُـهُ عَلَـى أسَـاسِ إبـرَاهيم عليه السلام...) (رَوَاهُ البُخاري، بـرقم: (١٥٨٥)}، واتە: ئەی عائیشە ئەگەر لەبـەر ئـەوە نـەبا گەلەكەت لە سـەردەمی كوفرو نەفامییـەوە نـزیكن، بناغـەی كەعبـەم ڕاسـت دەكـردەوەو، وەك ئـەو سـەردەمەم لێـدەكردەوە كە ئیـبراهیم داینـاوە. بـەڵام بۆئــەوەی كــە خەڵــكەكە بەلـبەلــەیەكی فكرییــان بــۆ دروســت نــەبێت، پێغەمبەر ﷺ چاوپۆشیی كـردوە لە ڕاستكردنەوەی بناغەی كەعبـە.

**مەســەلەی دووەم:** ئەوەیـە كـە لـە ئیـسلامدا ڕێگـاگرتن لـە خراپـە هەیـە (سـد الذَّرِیعَة) وە بەڕاسـتی زۆر لـە ئایەتـەكانو زۆر لـە فەرمایشتی پێغەمبـەر ﷺ دەلالەتی لەسەر دەكەن، كە مـسوڵمانان دەبـێ هـەموو ئـەو ڕێیانـە ببەسـتن كـە بەرەو گونـاح دەچـن، با ئـەو شتەش لـە ئەسڵدا موبـاح بێـت، بـۆ وێنـە: گـوتنی وشـەی: (رَاعِنَا) شـتێكی موباحـە، بـەڵام بـەكارهێنانی ئـەو وشـە موباحـە مـادام سـەردەكێــشێ بــۆ ئــەنجامێكی خــراپ، دەبــێ بەكــارنەهێنرێ، هــەروەها بەكارهێنـانی هەر شـتێكی دیكـەی ئاكـام خـراپ، دەبـێ ڕێگای لـێ بگیـرێ، بـۆ ئـەوەی سـەرنەكێشێ بـۆ شــتی خـراپ، بـۆ وێنـە: فرۆشــتنی چـەك بـە بابـای پیاوكوژو ستەمكار.

**مەســەلەی سێیەم:** ئەوە كە دەفـەرموێ: ﴿ فَاعْفُوا وَاصْفَحُوا حَتَّىٰ يَأْتِيَ اللَّهُ بِأَمْرِهِ ﴾، واتــە: تـا ئیـسلام زیـاتر دەچەسـپێو دەســتەڵات پەیـدا دەكـات، وە هەنـدێك لـە

تویێژەرەوان ئاوایان لێکداوەتەوە: هەتا خوا فەرمانتان پێ دەکات کە جیهاد لەگەڵ ئەهلی کیتاب بکەن، ئەگەر سەرانەیان نەدا جەنگیان لەگەڵدا بکەن، بەڵام لەڕاستیدا ئەوە وانیە بە بەڵگەی ئەوە کە دوای ئەوەی مسوڵمانان هێزو دەستەڵاتیشیان پەیدابوو و لەسەر پەیمان شکاندن توانییان وەدەریشیان بنێن، داوای سەردانیان لێنەکدن‌و ئەگەر غەدرو پەیمانشکێنی یان نەبووایە، هیچ کەس هەقی بەسەیانەوە نەدەبوو بەڵکو، مەبەست پێی ئەوەیە، هەتا خوا ﷻ کاری خۆی تەواو دەکاو کاری دینەکەی تەواو دەکاو ئیسلام سەقامگیر دەبێت‌و هێز پەیدا دەکات، چاوپۆشییان لێ بکەن، ئەوکاتە ئەو هێزو تواناییەیان نامێنێ کە بەو شێوەیە زەرەرتان لێبدەن‌و ئازارتان پێ بگەیەنن.

**مەسەلەی چوارەم:** ئەوەیە کە بەڕاستی نوێژ بەرپاکردن‌و زەکاتدان کە لە قورئاندا زۆر دووبارە کراونەتەوە، باشترین وەسیلەن بۆ ئەوەی ئینسان پێیان ڕووبەڕووی پیلان‌و فێڵی دوژمنان ببێتەوە، چونکە نوێژ بریتیە لە پەیوەندی پتەوکردنی خۆت لەگەڵ خواداو، زەکاتیش کە ماڵ بەخشینە، بریتیە لە پەیوەندی پتەوبوونی مسوڵمانان لەنێو خۆیانداو ڕوحم‌و بەزەییان بۆ یەکترو هاوکاریان بۆ یەکتر، ئێمە هەتا پەیوەندییان لەگەڵ خوا قایم تربێ‌و، لەنێو خۆمان یەکڕیزییمان چاکتربێ‌و، هاوکارییمان پێکەوە باشتربێ بەدڵنیایی دوژمنان کەمتر زەفەرمان پێدەبەن.

**مەسەلەی پێنجەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ وَمَا تُقَدِّمُواْ لِأَنفُسِكُم مِّنْ خَيْرٍ تَجِدُوهُ عِندَ ٱللَّهِ ﴾، واتە: هەرشتێك بە خێرو چاکە لە پێش خۆتان بەرێ بکەن لەلای خوا دەیبیننەوە، مسوڵمان هەر کارێکی خێر کە دەیکا، دەبێ بزانێ بۆلای خوا بەرێی دەکاو خوا بۆی هەڵدەگرێ، وەك پێغەمبەر ﷺ لە فەرمایشتێکدا فەرموویەتی: {(إِذَا مَاتَ الإِنْسَانُ انْقَطَعَ عَنْهُ عَمَلُهُ، إِلاَّ مِنْ ثَلاَثَةٍ: إِلاَّ مِنْ صَدَقَةٍ جَارِيَةٍ، أَو عِلْمٍ يُنْتَفَعُ بِهِ، أَوْ وَلَدٍ صَالِحٍ يَدْعُو لَهُ) (رَوَاهُ أَحْمَد فِي (المسند) برقم: (٨٨٣١)، وَالبُخَارِيُّ فِي (الأدب المفرد)، برقم: (٣٨)، وَمُسْلِم برقم: (٤١٩٩)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٢٨٨٠)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (١٣٧٦)، وَالنَّسَائِيُّ

برقم: (٣٦٥٣)، عَنْ أَبي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه)}، واتە: كاتێ ئینسان دەمرێ مەگەر لە سێ ڕێیانەوە ئەگەرنا كردەوەی چاكی دەبڕێ، بەڵام لە سێ ڕێیانەوە دوای خۆیشی هەر خێری بۆ دەچێت:

یەكەم: خێرێكی بەردەوام، ڕێیەكی چاككردوە، پردێك، مزگەوتێكی دروست كردوە، یاخود قوتابخانەیەك نەخۆشخانەیەك، هەتا ئەو شتە بمێنێ، ئەویش خێری بۆ دەچێت.

دووەم: زانیارییەكی بڵاوكردۆتەوە هەتا سوودی لێ ببینرێ، پاداشتی بەردەوامە.

سێیەم: منداڵێكی (صالح)ی هەبێ كوڕ، یان كچ، بۆی دەپاڕێتەوە، كاری خێرو چاكە دەكات، ئەو ئینسانە پیاو بێ، یان ئافرەت، خێرو پاداشتی بۆ دەچێ.

خوای پەروەردگار لەو كەسانەمان بگێڕێ بەهۆی تەقواوە لە پیلان و فێڵی ئەهلی كوفر پارێزراو دەبن.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی بیست و دووەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان تەرخان کردوە بۆ لێکۆڵینەوەیەك لەبارەی (نَسْخ)ەوە لە قورئاندا، دیارە بابەتی (نَسْخ) بابەتێکی زۆرگرنگەو زانایانی ئیسلام: چ توێژەرەوانی قورئان، چ زانایانی فەرموودەناس، چ زانایانی شەرعزان، چ زانایانی (أصُول فقه)، مشتومڕی زۆریان کردوە دەربارەی (نَسْخ)، کە ئایا لە قورئاندا (نَسْخ) هەیە، یاخود نیە؟! ئەگەر هەیە چۆن هەیە؟ ئایا قورئان ئێستا هیچ ئایەتی تێدا ماون (مَنسوخ) بن، واتە: حوکمەکەیان لاچووبێ، بەلاَم بێژە (لَفْظ)ی ئایەتەکانی مابنەوە ؟ وە ئایا هیچ ئایەت لە قورئاندا هەبوو ون کە بێژە (لَفْظ)و حوکمیان لاچووبێ ؟ من لە چەند خاڵێکدا ئەو بابەتە بەشێوەیەك کە بەگشتی خەڵك لێمان حاڵی بێ، پوختو کورت دەکەمەوەو بەپێی تواناش بۆتان لێك دەکێشمەوەو بۆتان ڕوون دەکەمەوە بۆ ئەوەی هەمووتان لێی تێبگەن.

**خاڵی یەکەم** : پێناسەی (نَسْخ):

لە زمانی عەرەبیدا (نَسْخ) بە سێ واتایان هاتوە، کە بریتین لە:

١ - (نَسْخ): بە مانای (الإزالة) لابردن دێت، وەك لە سوورەتی (الحج)دا خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن قَبۡلِكَ مِن رَّسُولٍ وَلَا نَبِيٍّ إِلَّآ إِذَا تَمَنَّىٰٓ أَلۡقَى ٱلشَّيۡطَٰنُ فِيٓ أُمۡنِيَّتِهِۦ فَيَنسَخُ ٱللَّهُ مَا يُلۡقِي ٱلشَّيۡطَٰنُ ثُمَّ يُحۡكِمُ ٱللَّهُ ءَايَٰتِهِۦۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٞ ﴿٥٢﴾ ﴾، واتە (ئەی موحەممەد ﷺ) ! لە پێش تۆدا هیچ ڕەوانەکراوێك و هیچ پێغەمبەرێکمان نەناردوە، مەگەر کاتێك کە ئایەتی خوای خوێندۆتەوە شەیتان

هێندێ قسەی خۆی خستۆتە (فرێداوەتە) نێو ئایەتەکان، بەڵام دوایی خوا ئەوەی کە شەیتان فرێی داوەتە نێو ئایەتەکانی لایان دەبا.

{(رسول): کەسێکە بەرنامەیەکی سەربەخۆی بۆ هاتبێ، بەڵام (نبيّ): کەسێکە بە دوای بەرنامەی (رسول)ێك کەوتبێ و مەرج نیە بۆخۆی بەرنامەیەکی سەربەخۆی بۆ هاتبێ}.

﴿ ...ثُمَّ يُحْكِمُ ٱللَّهُ ءَايَـٰتِهِۦ ۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴾، دوایی خوا ئایەتەکانی خۆی دادەمەزرێنێ بە شێوەیەك کە غەیری فەرمایشتی خۆی هیچی دیکەیان لەگەڵ تێکەڵ نەبێت، وە خوا زانای کاربەجێیە.

یانی: لە ئەسڵدا کە قورئان هاتوە تێکەڵی نەبووە، بەس لە کاتێکدا کە پێغەمبەر ﷺ دەیخوێنێتەوە، شەیتان لەسەر زمانی یەکێك، یاخود بە دەنگێکی دیکە لە شوێنێکی نەزانراوەوە، دێ، قسەیەك دەکات، کە ئەوەی نەشارەزابێ وا دەزانێ ئەویش هەر لەنێو ئایەتەکان دایە، ئەوە مانایەکی، مانایەکی دیکەشی ئەوەیە: کاتێك پێغەمبەر ﷺ خۆزگەیەك دەخوازێ، شەیتان لەو خۆزگەیەی ئەودا وەسوەسە دەخاتە نێو خۆزگەو ئاواتەکانییەوە.

٢- (نَسْخ): بە مانای (تَبدِیل) گۆڕین دێت، وەك خوا ﷻ لە سوورەتی (النحل)دا دەفەرموێ: ﴿ وَإِذَا بَدَّلْنَآ ءَايَةً مَّكَانَ ءَايَةٍ ۙ وَٱللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا يُنَزِّلُ قَالُوٓاْ إِنَّمَآ أَنتَ مُفْتَرٍۭ ۚ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿١٠١﴾ قُلْ نَزَّلَهُۥ رُوحُ ٱلْقُدُسِ مِن رَّبِّكَ بِٱلْحَقِّ لِيُثَبِّتَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَهُدًى وَبُشْرَىٰ لِلْمُسْلِمِينَ ﴿١٠٢﴾ ﴾، واتە: کاتێك ئایەتێك لادەبەین ئایەتێکی دی لەشوێن دادەنێین، وە خوا بۆخۆی دەزانی چی دەنێرێتە خوارێ، کافرەکان دەڵێن: تۆ بەناوی خواوە هەڵیدەبەستی، بەڵکو زۆربەیان نازانن. بلێ (روح القدس) - کە جوبرائیلە - لە پەروەردگارتەوە بە هەق ئەم قورئانە دادەبەزێنێ، بۆ ئەوەی کە دڵی ئیمانداران دابمەزرێ، وە ڕێنمایی و موژدەیە بۆ مسوڵمانان.

٣- (نَسْخ): بە مانای (نقل) گواستنەوە دێت، وەك خوا ﷻ لە سوورەتی (الجاثية)دا دەفەرموێ: ﴿ ...إِنَّا كُنَّا نَسْتَنسِخُ مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٢٩﴾ ﴾، واتە: ئێمە ئەی كافرەكان! ئەو كردەوانەی كە دەتانكرد لە دنیادا هەر ئەو كاتی نوسخەمان لێ دەگرتەوەو (إستنساخ)مان دەكرد. (إستنساخ) یانی چی؟ واتە: (نَسْخَة) لەبەرگرتنەوە، واتە: (طِبق الأصل) وەك ئەو دەرمان دێنا، كە ئەوە مەبەست پێی وێنەگرتنی ڤیدیۆییە، یاخود هەر شێوەیەكی دیكە كە خوا بۆخۆی دەزانی چۆن ئەو كردەوانە (copy) كۆپی دەكات، بۆیە بە ئینسانی نووسەر كە نووسینێك (نقل) دەكات لە كتێبێكی دیكە، پێی دەگوترێ (كاتب) یان پێی دەگوترێ (ناسخ)، یان پێی دەڵێن: (مُسْتَنْسِخ) یان (مُنْتَسِخ)، ئەوە لەڕووی زمانەوانییەوە، وشەی (نَسْخ) ئەو سێ مانایەی هەن.

**بەڵام ئایا لە زاراوەی (إصطلاح)ی زانایاندا وشەی (نَسْخ) یانی چی؟**

بە كورتی زانایان ئەو پێناسەیان كردوە: (إزالَة حُكم سَابق بِحُكمٍ لاَحِق)، واتە: لابردنی حوكمێكی پێشتر بە حوكمێكی دواتر، بەڵام ئەگەر بگوترێ: (إلغَاء وَحي سابق بوَحي لاَحِق) ئەوە چەمك و واتای (نَسْخ) فراوانتر دەبێ، لەبەر ئەوەی ئەو كاتە تەنیا حوكم ناگرێتەوە، بەڵكو غەیری حوكمیش دەگرێتەوە، وەحییەك دێت، وەحییەكی كە پێشتر هاتوەو باسی بابەتێكی كردوە لای دەبا[١]، بەڵام لە سۆنگەی ئەوەوە كە نەسخ تەنیا لە بواری یاسا شەرعییەكان (الأحكام الشرعية)دا دەبێ و بوارەكانی دیكە ڕوویان تێناكات، بۆیە ناچارین بڵێین هەر پێناسە باوەكەی زانایان ڕاستترو چاكتر، بگرەو ڕاست و چاكە.

(ابن القيم الجوزية) لە كتێبی (إعلام الموقعين) كە خاوەنی تەفسیری (محاسن التأويل) لە بەرگی (١) لاپەرە (٣٢) لێی گواستۆتەوە دەڵێ: ((مُرَادُ عَامَّةِ

---

١) ئەم پێناسەیەی دوایی هی: (دكتور مصطفى زَلمي) یە، بڕوانە: (التبيان لرفع غموض النَسْخ في القُرآن)، ص ٢١، ط (٢)، مكتب التفسير- مطبعة أربيل: ٢٠٠٠ م.

السَلَف بالنّاسخ والمَنسوخ: رَفعُ الحُكم بِجُملتهِ تَارَةً وهو اصطلاح المتأخرين، وَرَفْعُ دَلالَة العَامّ والمطلقِ والظاهر وغَيرها تَارَةً، إمَّا بتخصيص أو تقييد مُطلَق وحَمْلِهِ عَلَى المقيَّد وتَفسيره وتبيينه، حَتّى إنَّهُم يُسَمّونَ الإستثناء والشرط والصِّفة نَسْخاً، لتضمُّن ذلكَ رفع دلالة الظاهر وبيان المرادِ، فالنسخ عِندَهُم وفي لِسَانهم هُوَ بَيَان المُرَاد بغَير ذَلِكَ اللفْظ بل بأمرٍ خَارج عَنهُ، ومن تأمَّل كَلامَهم رأى من ذلك فيهِ مَالا يُحْصى وزالَ عَنهُ بهِ إشكَالاتٌ أوجبها حَمْلُ كَلامِهِم عَلَى الإصطلاح الحادث المتأخّر))، ئەوە پێناسەیەکی جوانە بۆ (نَسْخ) دەڵێ: (زۆربەی زانایانی پێشین - یان هەموویان - مەبەستیان لە (نَسْخ) ئەوە بووە، کە یان ئەوەتا حوکمێك پێشتر هاتوە دوایی خوا ﷻ حوکمێکی دیکە دەنێرێ‌و ئەوەی پێشی لادەبا، {بۆ وێنە: (ئەمە قسەی خۆمە) پێشتر ڕوویان لە (بیت المقدس) کردوە بۆ قیبلەو خوا ﷻ دوایی ڕووی پێکردنە کەعبە، ئەوە (نَسْخ)ە، حوکمێك پێشتر هەبووە کە ڕووکردنە (بیت المقدس) بووە، دوایی فەرموویەتی ڕووبکەنە کەعبە}، وە ئەوە زاراوەی پاشینەکانە کە وەختێ باسی (نَسْخ) دەکەن مەبەستیان پێی ئەوەیە کە حوکمێك بێ حوکمێکی پێشتر لابەرێ، بەڵام لە ئەسڵدا زانایانی پێشین وشەی (نَسْخ)یان بەکارهێناوە، بە چەند مانایەك: جاری وا هەیە ئایەتێکی گشتی هاتوە، بەڵام دوایی ئایەتێکی دی هاتوە ئەو حوکمە گشتییەیە تایبەت (تخصیص) کردوە، ئەوَشیان هەر بە (نَسْخ) ناوبردوە، یاخود حوکمێکی ڕەها (مطلق) هاتوە، دوایی ئایەتێکی دیکە هاتوەو حوکمەکەی مەرجدار (مقید) کردوە، ئەوەشیان هەر ناوناوە (نَسْخ)، یاخود ئایەتێك هاتوە باسی شتێکی کردوە بەشێوەیەکی نادیار (مُبْهَم) کە زۆر ڕۆشن نەبووەو ئایەتەکی دی زیاتر ڕۆشنی کردوە، ئەوەشیان هەر ناوناوە (نَسْخ)، یاخود ئایەتێك هاتوە باسی شتێکی کردوە بە کورتی (مجمَل)ی، ئایەتێکی دیکە هاتوە تەفصیلی داوەتێ و ڕوونی کردۆتەوە، ئەوەشیان هەر ناوناوە (نَسْخ)، بەڵکو جاری وابووە، هەڵاواردن‌و مەرج‌و سیفەتیشیان هەر بە نەسخ ناوبردوە، چونکە هەر کامێکیان لابردنی دەلالەتی ڕواڵەتیی‌و ڕوونکردنەوەی مەبەستیان گرتۆتە خۆی،

واتە: نەسخ لەلای وانو لە زاراوەی واندا بریتی بووە لە ڕوونكردنەوەی مەبەست بە خودی وشەكە نا، بەڵكو بە شتێكی دیكەی بەدەر لەوی، وە هەركەسێك لە قسەكانیان وردبێتەوە لەوبارەوە شتی بێژمارەیان تێدا دەبینیٚو، بەو هۆیەشەوە زۆر گریٚو گۆڵی لە كۆڵ دەبنەوە، كە لە سۆنگەی بەكارهێنانی قسەكانیان، بە چەمكو واتای زاراوی تازەو پاشینەوە، بۆی پەیدابوون.

ئەوە پوختەی ڕوونكردنەوەی قسەكەی (ابن القیم الجوزیة)یە، كە هەمان قسە هەركام لە: (ولـي الله الدهلَوي) لە (حُجَّةُ اللهِ بالِغَة)دا، وە: (الشَاطبي) لە (الموافقات)دا هێناویانە، واتە: ئەو سێ زانایە، وە زۆربەی زانایانی دیكەش دەڵێن: وەختێك وشەی (نَسْخ) لەلایەنی زانایانەوە بەكارهاتوە، مەبەستیان هەر ئەوە نەبووە حوكمێك بێو حوكمێكی پێشی لابەریٚ، بەڵكو مەبەستیان پێی ئەو واتایانەی دی بووە، كە پێشتر باسمكردنو زیاتر خەڵكی شارەزا لە (أصول الفقه) لەو زاراوانە حاڵی دەبێت

## خاڵی دووەم : مەرجەكانی (نَسْخ):

بۆئەوەی بزانین ئەم ئایەتە ئەوەی دیكەی (نَسْخ) كردۆتەوەو، ئەم حوكمە ئەوەی دیكەی (نَسْخ) كردۆتەوە، یان نا؟! چەند شتێك بە مەرج گیراون:

١- ئایەتێك لە قورئاندا پێی دەگوتریٚ لابەر (نَاسْخ) ، وە ئەوەی دیكە پێی دەگوتریٚ لابراو (مَنسُوخ) {بەپێی پێناسەی زانایانی پاشین، ئەگەرنا بەپێی زانایانی پێشین وشەی (نَسْخ) مەفهوومەكەی فراوانتر بووە} كە هەم ئایەتە (نَاسْخ)ەكەو، هەم ئایەتە (مَنسُوخ)ەكە، هەردووكیان ئایەتی قورئان بنو ئێستا لە (مُصْحَف)دا بن.

٢- دەبیٚ ئەو ئایەتەی كە ئەوەی پێشێی لابردوە، دوایی هاتبیٚ، چونكە هیچ ماقووڵ نیە بگوتریٚ: ئایەتێك، كە پێشتر هاتوە، ئایەتێكی نەسخ كردۆتەوە، كە دوایی هاتوە.

٣- دەبێت ئەو ئایەتەی، كە (نَسْخ) دەبێتەوە، قابیلیەتی ئەوەی هەبێ كە (نَسْخ) بێتەوە، ئەویش بەس ئەو ئایەتانەن، كە باسی یاسا شەرعییەكان دەكەن، ئەگەرنا ئەو ئایەتانەی، كە باسی بەهەشتو دۆزەخ دەكەنو، ئەو ئایەتانەی باسی بەسەرهاتی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) دەكەنو، ئەو ئایەتانەی باسی عەقیدەو ئیمانو تەوحید دەكەنو، ئەو ئایەتانەی باسی ئەخلاق دەكەن، ئەوانە ناگونجێ (نَسْخ) ببنەوە، چونكە بەسەرهاتی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) ئەگەر خوا (نَسْخ)ی بكاتەوە، وەك بڵێی پێشێ نەیزانیبێو دوایی بۆی دەركەوتبێ، كە ئەو پێغەمبەرە ئاوا ژیاوە، ئەوەش موستەحیلە بۆ خوا، هەروەها ئیمانو عەقیدە كۆمەڵێك بنەمای نەگۆڕنو (نَسْخ)یان تێدا نیە، هەروەها ئەخلاقو ڕەوشتو بەندایەتیی بۆ خوا... ئەو جۆرە بابەتانە، قابیلی (نَسْخ) نین، بەڵكو ئەوەی (نَسْخ)ی تێدا دەگونجێ، تەنیا حوكمە شەرعییەكانن، تا ئێستا خوا فەرموویەتی: ئەو شتە بكەن، لەمەولا دەفەرموێ: مەیكەن، بۆ وێنە: مەسەلەی ڕووگە (قبلة) كە ئەویش لە قورئاندا نەهاتوە بفەرموێ: ڕووبكەنە (بیت المقدس)، بەڵكو تەنیا ئەوە لە قورئاندا هەیە، كە دەفەرموێ: ڕوو وەرسووڕێنن بەرەو كەعبە، بەڵام لە سوننەتی پێغەمبەردا هاتوە ﷺ كە ڕوو بكەنە (بیت المقدس)، كەواتە: لێرەدا ئەگەر (نَسْخ)یش هەبێ، دەڵێین: ئەوە قورئان سوننەتی (نَسْخ) كردۆتەوە، بەڵام قورئان قورئانی (نَسْخ) نەكردۆتەوە.

٤- وەختێك ئەو دوو ئایەتە بە (ناسخ)و (مَنسُوخ) دادەنرێن، واتە: یەكیان بە هەڵوەشێنەرو ئەویدیكە بەهەڵوەشێنراو، یان (لابەرو لابراو)، كە بەیەكەوە دژو ناكۆك (مُتَنَاقض)بن، نەك تەنیا جۆرێك لە تێكگیران (تَعَارُض)ی ڕواڵەتییان هەبێ، چونكە جاری وا هەیە دوو ئایەت بە شێوەیەكی ڕواڵەتیی تێكگیرانیان لە نێوانیاندا هەیە، بەڵام پێكەوە دژو ناكۆك نین، تێكگیرانەكەش لەبەر ئەوەیە كە یەكیان گشتی یە ئەویدیكەیان تایبەتە، یاخود یەكیان موتڵەقەو ئەیدیكەیان مەرجدارە، یاخود یەكێكیان ڕوون (مُفَصل)ەو ئەویدیكەیان كورت (مُجْمَل)ە، واتە: لەبەر ئەوەنیە، كە پێكەوە دژبن.

**خاڵی سێیەم:** ئایا (نَسْخ) لە قورئانـدا هەبووە؟ واتـە: ئایا خوای کاربـەجێ هیچ ئایەتی لە قورئانـدا ناردوونـە خوار دوایـی سـڕیبنیەوە؟ ئنجا ئەگـەر بڵێین: بەڵێ، دەگوترێ: ئایا ئێستا لە قورئاندا هیچ ئایەتی وا هەن؟ یان وەختی خۆی خوا هەندێك ئایەتی ناردوونو پاشان لایبـردوون، بەلاَم ئێستا لـە قورئانـدا نین؟ لەوبارەوە پێویستە ئەو چوار ڕاستییە بزانین:

١- جارێ ئەوە کە ئیسلام شەریعەتەکانی پێش خۆی (نَسْخ) کردۆتـەوە، ئـەوە لـە چەندان ئایەتدا هاتوە: بۆ وێنە: خوای کاربەجێ دەفـەرموێ: ﴿ فَإِنْ حَآجُّوكَ فَقُلْ أَسْلَمْتُ وَجْهِيَ لِلَّهِ وَمَنِ ٱتَّبَعَنِۗ وَقُل لِّلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْأُمِّيِّـۧنَ ءَأَسْلَمْتُمْۚ فَإِنْ أَسْلَمُواْ فَقَدِ ٱهْتَدَواْۖ وَّإِن تَوَلَّوْاْ فَإِنَّمَا عَلَيْكَ ٱلْبَلَٰغُۗ وَٱللَّهُ بَصِيرٌۢ بِٱلْعِبَادِ ﴿٢٠﴾ ﴾ آل عمران، واتە: جا ئەگەر (ئەهلی کوفر) موناقەشەیان لەگەڵ کردی بڵـێ: مـن خۆمو ئەوانەی شوێنمکەوتوون بۆ خوا ملمان کەچکردوە، وە بە ئـەهلی کیتـابو بەوانەی کە نەشارەزان بڵـێ: ئایـا ملکەچ بـوون؟ جـا ئـەگـەر ملکەچ بـوون، یـان (مسوڵمان بوون) ئەوە ڕێی ڕاسـتیان گرتـوە، بـەلاَم ئـەگـەر پـشتیان هـەڵکرد تـۆ تەنها ڕاگەیاندنت لەسەرە، وە خوا بینەری بەندەکانە.

هـەروەها لـە سـوورەتی (البقـرة)دا دەفـەرموێ: ﴿ فَإِنْ ءَامَنُواْ بِمِثْلِ مَآ ءَامَنتُم بِهِۦ فَقَدِ ٱهْتَدَواْۖ وَّإِن تَوَلَّوْاْ فَإِنَّمَا هُمْ فِي شِقَاقٍۖ ... ﴿١٣٧﴾ ﴾، واتـە: جـا ئـەگـەر (خـاوەن کـتێبەکـانو خەڵك بە گشتی) ئیمانیان هێنا، وەك چۆن ئێوە ئیمانتـان هێنـاوە، ئەوە ڕێی ڕاستیان گرتوە، ئەگەرنا ئەوە لە دووبەرەکییدان (لەگەڵ خـوادا ﷻ). کەواتە: شەریعەتی ئیسلام هەموو بەرنامـەکانی پـێش خـۆی (نَسْخ) کردۆتـەوە لـەو حاڵانـەدا کـە لەگـەڵی تێکدەگیـرێن، ئەگـەرنا لـە بنـچینەکانداو لـە پایـە بنەڕەتییەکاندا، شەریعەتەکانی پێغەمبەران هەموویان یەك بوون.

٢- بە دڵنیایی (نَسْخ) لە سوننەتی پێغەمبەردا ﷺ بووە، واتە: پێغەمبەری خوا کاتێك شتێکی فەرمووە، دوایی بە فەرموودەیەکی دیکە ئەو بڕیارەی هەڵوەشاندۆتەوە، بۆ وێنە: لە (صحیح)ی (مُسلم)و لە (المسند)ی ئیمام ئەحمەد دا هاتوە کە پێغەمبەر دەفەرموێ: {(كُنْتُ نَهَيْتُكُمْ عَنْ زِيَارَةِ الْقُبُورِ فَزُورُوهَا، فَإِنَّهَا تُذَكِّرُكُم الآخِرَةَ) (رَوَاهُ أَحْمَد بِرقم: (١٢٣٥)، وَمُسْلِمٌ بِرقم: (٢٢٥٧)، وَالنَّسَائِيُّ بِرقم: (٣٦٩٨)، وَالتِّرمِذِيُّ بِرقم: (١٠٥٤)، وَابْنُ مَاجَهْ بِرقم: (١٥٧١) وَاللَّفْظُ لأحمد}، واتە: پێشتر لێم قەدەغە کردبوون بچنە سەر گۆڕستان، ئەی مسوڵمانینە ! (لەگەڵ پیاوو ئافرەتانیەتی بەگشتی) بەڵام ئێستا سەردانی بکەنو بچن، چونکە دوا ڕۆژتان دەخاتەوە بیر، یاخود مردنتان دەخاتەوەبیر، کەواتە: کە پێغەمبەر ﷺ لە قۆناغێکدا لە مسوڵمانانی قەدەغە کردبوو، بچنە سەر گۆڕستانو لەدواییدا فەرمانیان پێدەکات کە بچن، بەلایەنی کەم موباحە یان سوننەتە، بۆیەش پێشێ لێی قەدەغە کردبوون، چونکە خەڵك لەسەردەمی بتپەرستییو شیرکەوە نزیك بووەو، مەترسیی ئەوەی هەبووە بچنە سەرقەبرانو لە خاوەن قەبرەکان بپاڕێنەوە، وەك ئێستا زۆر مسوڵمانانی نەفامو نەزان وا دەکەنو لە خاوەن قەبرەکە، لەو ئێسكو پروسکە دەپاڕێنەوە، کە بێگومان ئەوانە ئەگەر کەسانی چاکیش بووبن، تازە بۆ خۆیان چوونەتە عالەمی بەرزەخ و ئیشیان لە دنیادا نەماوەو، بێجگە لە خواش ﷻ، نابێ لە هیچ کەس بپاڕێیەوەو هاواری تێببەستی، بۆ ئەو شتانەی کە بە خوا نەبێ بە کەس ناکرێن، کەواتە: لە سوننەتی پێغەمبەردا ﷺ (نَسْخ) هەبووە.

٣/ ئنجا ئەوە کە خوا ﷻ ڕووکردنە (بيت المقدس)ی نەسخ کردۆتەوە بە ڕووکردنە کەعبە، ئەوە پێی دەگوترێ (نَسْخ)ی سوننەت بە قورئان بۆچی؟ چونکە لە هیچ ئایەتێکدا نەهاتوە بڵێ: ڕوو بکەنە (بيت المقدس) تا بڵێین: خوا ﷻ پێشتر فەرموویەتی: ڕووبکەنە (بيت المقدس)، ڕووبکەنە (المَسجِدِ الأقصى)و دوایی فەرموویەتی: ڕووبکەنە مزگەوتی حەرام، کە کەعبەی لێیە، بەڵکو پێغەمبەر ﷺ کە چووە بۆ مەدینە، وە ڕەنگە لە

مەککەش وا پێدەچێ هەر ڕوویان لە (بیت المقدس) کردبێ، بەڵام دوایی خوا ﷻ دوای (١٧) مانگ لە چوونیان بۆ مەدینە، فەرموویەتی: ﴿ قَدْ نَرَىٰ تَقَلُّبَ وَجْهِكَ فِي السَّمَاءِ فَلَنُوَلِّيَنَّكَ قِبْلَةً تَرْضَاهَا فَوَلِّ وَجْهَكَ شَطْرَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ وَحَيْثُ مَا كُنتُمْ فَوَلُّوا وُجُوهَكُمْ شَطْرَهُ ...﴿١٤٤﴾ ﴾البقرة، دیارە پێغەمبەر ﷺ زۆر لە خوا پاڕاوەتەوەو چاوەڕێی کردوە، ڕووی وەرسووڕێنێ لە (بیت المقدس)ەوە بەرەو کەعبە، بۆیە دەفەرموێ: ﴿ قَدْ نَرَىٰ تَقَلُّبَ وَجْهِكَ فِي السَّمَاءِ ﴾، واتە: ڕووت دەبینین کە تەماشای ئاسمان دەکەی {بەڵکو خوای پەروەردگار فەرمانت بۆ بنێری} ﴿ فَلَنُوَلِّيَنَّكَ قِبْلَةً تَرْضَاهَا ﴾، بۆیە ڕووت پێ وەردەسووڕێنین بەرەو ڕووگەیەك کە پێت خۆشبێ، ﴿ فَوَلِّ وَجْهَكَ شَطْرَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ ﴾، جا ئێستا ڕوو لەلای مزگەوتی حەرام بکە ﴿ وَحَيْثُ مَا كُنتُمْ فَوَلُّوا وُجُوهَكُمْ شَطْرَهُ ﴾ وە لە هەر شوێنێك بوون ڕوو لەلای وێ بکەن، (شَطْرَهُ) واتە: (نَحْوَهُ) یانی: ڕوو لەلای وێ بکەن، لێرەدا ئایەتی خوا ﷻ، سوننەتی پێغەمبەری ﷺ (نَسْخ) کردۆتەوە.

بەڵام ئایا قورئان قورئانی (نَسْخ) کردۆتەوە؟ بەڕاستی بە شێوەیەکی دڵنیاکەر بە ئێمە نەگەیشتوە کە بتوانین بڵێین: ئەو ئایەتە لە قورئاندا بووەو ئەو ئایەتەی دیکەی لابردوە.

شایانی باسیشە سەرجەم ئەو زانایانەی کە بڕوایان وایە ئایەتەکانی قورئان (ناسخ)و (مَنْسُوخ)یان تێدایە، دوو ئایەت بە بەڵگە دێننەوە، کە یەکەمیان ئایەتی ژمارە (١٠٦)ی سووڕەتی (البقرة)یە کە دەفەرموێ: ﴿ مَا نَنسَخْ مِنْ آيَةٍ أَوْ نُنسِهَا نَأْتِ بِخَيْرٍ مِّنْهَا أَوْ مِثْلِهَا أَلَمْ تَعْلَمْ أَنَّ اللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴾، واتە: هیچ ئایەتێك لانابەین یان لەبیری نابەینەوە، مەگەر یەکی چاکتر لە خۆی یان وەك خۆی دێنین، ئایا نازانی کە خوا لەسەر هەموو شتێك توانادارە!

وە دووەمیـــان ئایـــەتی ژمـــارە (١٠١)ی ســـوورەتی (النحـــل)ە، کـــە دەفـــەرموێ: ﴿ وَإِذَا بَدَّلْنَآ ءَايَةً مَّكَانَ ءَايَةٍ وَٱللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا يُنَزِّلُ قَالُوٓاْ إِنَّمَآ أَنتَ مُفْتَرٍۭ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴾، واتە: وە کاتێك ئایەتێك دێنینە شـوێنی ئایەتێك (جێگۆڕکێیان پێدەکەین) دەڵێن: بێگومان خۆت هەڵتبەستوە (واتە: بەناوی خواوە گوتووتە ئەگەرنا وانیە)، بەڵکو زۆربەیان نازانن.

٤- بەڵام ئەوەی کە گرنگە ئێمە هەموو لایـەك بیزانین، ئەوەیە کـە زێـدەڕۆیی زۆر لەوبارەوە لەلایەن هەندێك لە زانایانەوە کراوە، بۆ وێنـە: زانایـەك بـەناوی (هبة الله بن سلام البغدادي) لە کتێبی (الناسخ والمَنسوخ)دا دەڵێ: ((إنَّ آية السَيف ﴿ ... فَٱقْتُلُواْ ٱلْمُشْرِكِينَ حَيْثُ وَجَدتُّمُوهُمْ ... ﴾ نَسَخَت مِنَ القُرآن مِائَةَ وَأربَعَاً وَعِشرين آيَةَ، ثُمَّ صَارَ آخِرُها نَاسِخاً لأوَّلِها ﴿ ... فَإِن تَابُواْ وَأَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَوُاْ ٱلزَّكَوٰةَ فَخَلُّواْ سَبِيلَهُمْ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ۝٥ ﴾ التوبة))، واتـە: ئایەتی شمشێر (ئایەتێك هەیە لە قورئاندا توێژەرەوانی قورئـان هـەر لەخـۆوە ناویان لێناوە: ئایەتی شمشێر (آية السيف)، سەرەتای ئایەتەکەش دەفەرموێ: ﴿ ... فَٱقْتُلُواْ ٱلْمُشْرِكِينَ حَيْثُ وَجَدتُّمُوهُمْ ... ﴾، واتـە: لـە هـەر شـوێنێك هاوبـەش پەیداکەرەکانتان بینی‌و بۆتـان هەڵـکەوتن بیانکـوژن، دەڵـێ: سـەرەتای ئـەم ئایەتـە سـەدو بیسـت‌و چـوار (١٢٤) ئایـەتی لـە قورئانـدا (نَسْخ) کردۆتـەوە، دوایـیش کۆتـایی ئـەم ئایەتـە سەرەتایەکەیـشی هـەر (نَسْخ) کردۆتـەوە، کۆتاییەکەی دەفەرموێ چی؟ دەفەرموێ: ئەگەر موشریکەکان تۆبەیان کردو نوێژیان کردو زەکاتیاندا، بەریانبدەن‌و لێیان گەڕێن، بێگومان خوا لێبوردەی بە بەزەیی یە، جا ئایا ئـەوە چـۆن دەبێـت خـوا ڕسـتەیەك بنێـرێ (١٢٤) ئایـەت (نَسْخ) بکاتەوەو، پاشان ڕستەی دوایی ئەو ئایەتەش ڕستەی پێشووی (نَسْخ) بکاتەوە ؟!، ئەوە بەڕاستی لە کەلامی خوا ناوەشێتەوە.

هەروەها (ابن الجوزي) گوتوویەتی: (٢٤٧) ئایەتی (مَنسوخ) هەیە! وە (عبدالقهار البغدادي) دەڵێ: (٦٦) ئایەت هەیەو (السیوطي) كە لە هەمووان كەمتری گوتوە، دەڵێ: (٢٠) ئایەتی (مَنْسوخ) هەیە! بەڵام ئەوەی كە من پێم پەسندو ڕاستە لەوبارەوە ئەو ڕایەیە كە دەڵێ: ئێستا لەم قورئانەی كە لەبەردەستماندا هەیە، نەك ئایەتێك بەڵكو بەشێكیش لە ئایەتێكی تێدا نیە كە (مَنسوخ) بێت، واتە: حوكمەكەی لابرابێ‌و ئیشی پێ نەكرێ، وە هەموو ئەو ئایەتانەی كە زانایان پێیان وایە (مَنسوخ)ن، یان ئەوەتا كە زانایانی پێشین گوتوویانە (مَنسوخ)ن، مەبەستیان پێی ئەوە بووە كە ئەو ئایەتە گشتی (عام) بووەو ئایەتێكی دیكە هاتوە تایبەتی كردوە، یان ڕەها (مُطلق) بووەو بەنددار (مُقیَّد)ی كردوە، یان بەكورتی (مجمَل) بووەو درێژە (تفصیل)ی داوەتێ، یاخود ڕوون نەبووەو زیاتر ڕوونی كردۆتەوە، یاخود هەڵاواردن (استثناء)ی تێخستوە، ئەگەرنا لەو قورئانەدا كە ئێستا لەبەردەستمانە، هیچ ئایەتێكی تێدانیە (مَنسوخ)بێ‌و ئیشی پێنەكرێ، وە خوا پشتیوان بێت ئێمە لەدرێژەی دەرسەكانی تەفسیردا كە دەیانگەینێ ئایەتەكان هەموویان ڕوون دەكەینەوەو، ساغی دەكەینەوە كە هیچ ئایەتێك لە قورئاندا نیە (مَنسوخ) بێ‌و ئیشی پێنەكرێ.

دیارە یەكەمین كەس لە توێژەرەوانی قورئان پاش برەوپەیداكردنی ئەو چەمكە تایبەتییە بۆ (نَسْخ) كە ئاماژەمان پێدا لەنێو زانایانی پاشیندا، كە گوتی: قورئان مەنسووخی تێدانیە، (أبو مسلم الأصفهاني)یە كە ناوی (محمد بن بحر الأصفهاني)یەو دەڵێ: هیچ ئایەتێكی (نَسْخ) كراوە لە قورئاندا نیە، وەك خاوەنی (محاسن التأویل) لە بەرگی (١) لاپەڕە (٣٢)دا، لێی نەقڵ كردوە، وە ئێستا ژمارەیەكی زۆر لە زانایان هەمان ڕایان هەیە، بۆ نموونە: یەكێك لەوانە (محمد خضري بك) خاوەنی كتێبی (أصول فقه) كە، (السیوطي) دەڵێ: (٢٠) ئایەت (مَنسوخ)ە، ئەو ڕوونی دەكاتەوە هیچ كامیان ئێمە ناچار نین بڵێین (مَنسوخ)ن‌و، هەموویان یان ئەوەتا پلەپلەیان

تێدایە، یان ئەوەتا ڕەهاو گشتی و کورتن و، ئایەتەکانی دیکە بەنددار (مُقیَّد)و تایبەتمەند (تَخصیص)و شەرح (تفصیل)یان کردوون.

بەرێزان!

ئێستاش بۆ زیاترو چاکتر ڕوونبوونەوەی مەبەست، بە پێویستی دەزانم سەرەتا سێ خاڵی گرنگ لەبارەی (نَسْخ)ەوە بخەمەڕوو، پاشان چەند نموونەیەکیش بێنینەوە بۆ زیاتر ڕوونکردنەوەی چەمك و واتای هەرکام لە: (تقیید المُطلَق)و (تَخصیص العام)و (تبیین المجمَل)و (تَدرّج) کە زانایانی پێشین وشەی (نَسْخ)یان بۆ هەموویان بەکارهێناوە:

**خاڵی یەکەم:** کە بە پێویستی دەزانم بۆتان ڕوون بکەمەوە هەرچەندە لە دەرسی ڕابردووشدا تیشکمان خستەسەر، بەڵام حەزدەکەم زیاتر بەرچاوتان ڕۆشن بێ، ئەوەیە کە ئێمە سێ وشەمان هەن: وشەی (نَسْخ)و (نَاسِْخ)و (مَنسوخ).

**یەکەم:** وشەی (نَسْخ) وەك لە ڕابردوودا باسمان کرد، وشەی (نَسْخ) بە سێ مانا دێت: لابردن، گۆڕین، گواستنەوە (الإزَالة والتَبْدِیل والنَقْل) ئەمە لە ئەسڵی زماندا، بەڵام زانایان کە وشەی (نَسْخ)یان بەکارهێناوە وەك زاراوە (اصطلاح)ێك، ئەوەیە مەبەستیان پێی لابردنی حوکمێکی شەرعییە کە پێشتر هاتوە، بە حوکمێکی دی کە دواتر دێت، یاخود مەبەستیان پێی لابردنی کارپێکردنی ئایەتێکە، کە پێشتر دابەزیوە، بە ئایەتێکی دیکە کە دوای ئەو دادەبەزێ، دیارە ئەوەش هەمووی ئەگەر گریمان بشبووبێ، لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ تەواو بووە.

**دووەم :** وشەی (نَاسِْخ)یش لەسەر کێش (وزن)ی (فاعل) بەمانای لابەر دێت، کە مەبەستمان پێی ئایەتێکە کە ئایەتێکی پێشتر یان حوکمەکەی لابردوە.

**سێیەم:** وشەی (مَنسوخ)یش بەمانای لابراو، دێ: وە مەبەست لە (مَنسوخ) ئەو ئایەتەیە کە پێشتر دابەزیوە، وە دوایی ئایەتێك بەدوایدا هاتووەو (نَسْخ)ی کردۆتەوە، واتە هەم خوێندنەوەکەی، هەم حوکمەکەی لابردوە، یاخود تەنیا

حوكمەكەی لابردوە، بەپێی ڕای هەندێك لەوانە كە پێیان وایە هەندێ لە ئایەتەكانی قورئان حوكمیان (نَسْخ) كراوەتەوە، بەلاَم لە قورئاندا هەرماون و دەخوێندرێنەوە، كە من لە ڕابردوودا باسمكرد كە ئەوە شتێكی هەڵەیەو، هیچ ئایەتێك لە قورئانی ئێستادا بوونی نیە كە حوكمی پێنەكرێ، یان حوكمەكەی لابرابێ و هەڵوەشێنرابێتەوە.

**خاڵی دووەم:** هۆی سەرەكی بەهەڵەدا چوونی هەندێ لە توێژەرەوانی قورئان، لەوەدا كە هەندێك لە ئایەتەكانیان بە مەنسووخ داناوە، كە وەك گوتم كەمترینیان ئەوانەن كە (٢٠) ئایەتی بە (مَنسوخ) داناون و زۆرترینیان ئەوانەن كە هەتا (٥٠٠) ئایەتیان بە (مَنسوخ) داناوە.

بەڵێ گەورەترین هۆی بەهەڵەداچوونیان و سەرەكیترینی ئەوەیە كە پێناسەی زانایانی پێشین لەگەڵ زانایانی پاشینیان دەربارەی (نَسْخ) تێكەڵ كردوە، چونكە زانایان پێشین جۆرێك لە پێناسەیان هەبووە بۆ (نَسْخ) كە چەمك و واتایەكەی زۆر فراوان بووە، بەلاَم زانایانی دوایی كە وشەی (نَسْخ)یان بەكارهێناوە، وەك زاراوەیەك بەكاریانهێناوە كە واتایەكی دیاریكراوی هەیە كە دەڵێ: (رَفْعُ حكمٍ شَرعِي بدَليل شَرعِي)، واتە: لابردنی یاسایەكی شەرعییە بە بەڵگەیەكی شەرعیی، وە هێندێكیشیان ئاوایان پێناسە كردوە: (إلغَاءَ وَحيٍ سَابِق بِوَحي لاَحِق)، واتە: لابردنی وەحییەكی پێشترە بە وەحییەك كە دواتر هاتوە، كەواتە: پێناسەی زانایانی پاشین بۆ (نَسْخ) واتاو چەمكێكی تایبەت و دیاریكراوی هەیە، بەلاَم زانایانی پێشین (سلف) كە وشەی (نَسْخ)یان بەكارهێناوە واتاو چەمكەكەی زۆر فراوانە، وەك پێشتریش ئاماژەمان پێدا.

بۆ وێنە: (الشَاطبي) كە یەكێكە لە زانایانی بەرجەستەی پسپۆڕ لە بواری (أصول فقه)دا لەبارەی (نَسْخ)ەوە، لە كتێبی (الموافقات)دا دەڵێت[1]:

---

١) بڕوانە (محاسن التأويل) لجمال الدين القاسمي، ج(١)، ص(٣٣، ٣٤)، كە ئەم دەقەی لە (الشاطبي) خواستۆتەوە.

((الَّذي يظهر مِن كَلامِ الـمُتَقَدِّمِين أنَّ النَّسخ عِندَهُم فـي الإطلاَق أعَـمُّ عَمَّا هُوَ فـي كَلاَم الأُصُولِيين، فَقَد يُطْلِقونَ عَلَى تَقييد الـمُطَلق نَسخاً، وعَلَى تَخصِيصُ العمُوم بِدَليلٍ مُتَصِل أو مُنفَصِل نَسْخَاً، وعَلَى بَيان الـمُبهَم والمُجمَل نَسْخَاً، كَمَا يُطْلِقون عَلَى رَفعُ الحُكم الشَّرعي بدَليل شَرعي مُتأخرٍ نَسخَاً، لأن جميع ذَلِكَ مُشتَرِك فـي مَعْنَىً واحِدٍ وَهُوَ: أَن النَّسْخ في الإصطلاح المتأخر اقتضى أن الأَمر الـمُتَقَدِّم غَير مُراد فـي التَّكلِيف وإنَّما الـمُرَاد ماجيء به أخيراً، فالأوَل غَير مَعمُول بهِ والثاني هُوَ الـمَعمُول بهِ))، واتـە: ئـەوەی کـە دەردەکـەوێ لـە قـسەی پێـشووەکان {واتـە: زانایـانی پێشین} ئەوەیـە کـە (نَسْخ) لـەلای ئـەوان کـە بەکاریانهـێناوە، ماناکـەی زۆر فراوانتـر بووە لەو مانایەی کە دوایی زانایانی (أصول الفقـە) بـەکاریانهێناوە، چونکە جاری واهەیە وشـەی (نَسْخ) بـەکاردێنن بۆ شتێك کـە بـە موتلّەقیی باسـکراوە، بـەڵام دوای مەرجـدارکراوە، وە جـاری وا هەیـە وشـەی (نَسْخ) بەکاردێنن بۆ حوکمێك کە بەگشتی گوتراوە، بـەڵام دوایـی بـە بەڵگـەیەك کـە هەر لەگەڵ خۆیدا یاخود دوایی هاتوە، تایبـەت کـراوە، وە هـەروەها شتێك کـە بەکورتی (مُجْمَـل)ی و ناڕوونیی باسکراوەو دوایی ڕوون کراوەتەوە، ئەوەشیان هەر بە (نَسْخ) نـاوبردوە، وە هـەروەها لابردنـی حـوکمێکی شەرعییـشیان بـە بەڵگەیەکی شەرعیی کە دوایی هـاتوە، بـە (نَسْخ) نـاوبردوە، چونکە هەریـەك لەمانە لەیـەك مانـادا یەکدەگرنـەوە، کـە بریتیـە لـەو مانایـەی کـە لـە زاراوەی زانایانی دواییدا بەکارهاتوە، کە بریتیە لەوەی فەرمانێك کە پێشتـر کراوە لـە دەقێکی شەرعییدا مەبەست پێـی ئەوەنیـە، بـەڵکو مەبەسـت پێـی ئەوەیـە کـە لەدواییدا هاتوە: {کە یان (مُطْـلَق) بـووە (مُقَیّـد)ی کـردوە، یـان (عام) بـووە (تَخْـصِیص)ی کــردوە، یــاخود (مُجْمَــل) بــووەو ڕوونـــی کردۆتـــەوە، وە (تَفْـصیل)ی داوەتـێ}، بۆیـە هـی یەکـەم کـاری پێنـاکرێ و هـی دووەم کــاری پێدەکـرێ.

**خاڵی سێیەم:** هەبوونی (نَسْخ) لە قورئاندا مانای ئەوەی نیە ئێستا لە قورئاندا ئایەتی (مَنسوخ) هەیە، ئێمە ئەگەر تەماشای هەندێ لە ئایەتەکانی قورئان بکەین، ئەوەیان لێ دەفامرێتەوە کە دەگونجێو ئەگەری ئەوە هەیە لە قورئاندا خوا ﷻ هەندێ لە ئایەتەکانی بە هەندێکیان (نَسْخ) کردبنەوە، بۆ وێنە: ئەو ئایەتەی، کە دەفەرموێ: ﴿مَا نَنسَخْ مِنْ ءَايَةٍ أَوْ نُنسِهَا نَأْتِ بِخَيْرٍ مِّنْهَآ أَوْ مِثْلِهَآ ۗ أَلَمْ تَعْلَمْ أَنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿١٠٦﴾﴾البقرة، واتە: هیچ ئایەتێك لانابەین یاخود لەبیری نابەینەوە، ئەگەر بە: (**نُنسِهَا**) بخوێنرێتەوە، وە ئەگەر بە (نَنْسَئْهَا) بخوێنرێتەوە، کە بەو قیرائەتەش هاتوە، واتە: هیچ ئایەتێك لانابەین یاخود دوای ناخەین ﴿نَأْتِ بِخَيْرٍ مِّنْهَآ أَوْ مِثْلِهَآ﴾، ئەوە حەتمەن یەکێکی لەخۆی چاکتر، یان وەك خۆی دێنین، هەروەها لە سوورەتی (النحل)دا دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا بَدَّلْنَآ ءَايَةً مَّكَانَ ءَايَةٍ ۙ وَٱللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا يُنَزِّلُ قَالُوٓا۟ إِنَّمَآ أَنتَ مُفْتَرٍۭ ۚ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿١٠١﴾﴾، واتە: ئەگەر ئایەتێك لابەرینو ئایەتێکی دی بێنینە جێی، وە خوا بۆخۆی دەزانێ چی دەنێرێتە خوارێ، کافرەکان دەڵێن: تۆ بەناوی خواوە قسە هەڵدەبەستی بەڵکو زۆربەیان نازانن. کەواتە: بەپێی ئەم دوو ئایەتە هەروەها ئەم ئایەتەش لە سوورەتی (یونس)دا هەمان شتی لێ دەفامرێتەوە، کە دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ءَايَاتُنَا بَيِّنَٰتٍ ۙ قَالَ ٱلَّذِينَ لَا يَرْجُونَ لِقَآءَنَا ٱئْتِ بِقُرْءَانٍ غَيْرِ هَٰذَآ أَوْ بَدِّلْهُ ۚ قُلْ مَا يَكُونُ لِىٓ أَنْ أُبَدِّلَهُۥ مِن تِلْقَآئِ نَفْسِىٓ ۖ إِنْ أَتَّبِعُ إِلَّا مَا يُوحَىٰٓ إِلَىَّ ۖ إِنِّىٓ أَخَافُ إِنْ عَصَيْتُ رَبِّى عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ ﴿١٥﴾﴾، واتە: وە ئەگەر ئایەتە ڕۆشنەکانی ئێمەیان بەسەردا خوێنرانەوە، ئەوانەی بڕوایان بەدیداری خوا نیە لە دواڕۆژدا، دەڵێن: قورئانێکی دیکە بێنە یاخود بیگۆڕە (واتە: هەندێ لە ئایەتەکانی بگۆڕە) بڵێ: من بۆم نیە

کە لەخۆمەوە بیگۆڕم، من تەنیا شوێن ئەوە دەکەوم کە بۆم دەنێرری، من ئەگەر سەرپێچیی پەروەردگارم بکەم، لە ئازاری ڕۆژێکی مەزن دەترسم.
کەواتە: بەپێی ئەم سێ ئایەتە دەگونجێ خوا ﷻ هەندێك لە ئایەتەکانی کە ناردوونیە خوارێ، گۆڕیبنی‌و هەندێ ئایەتی دیکەی لە شوێن دانابن، بەڵێ ئەمە ئەگەری هەیە، بەلام ئەم ئەگەر (إحتمال)ە، ئەوە ناگەیەنێ، کە لە قورئانی ئێستادا ئەم (مصحف)ەی لەبەردەستمانە، هیچ ئایەتی تێدابن کە خوا حوکمەکەی لابردبن‌و بێژەکانیان مابنەوە، ئەو ڕیوایەتانەش کە باس دەکرێن کە فلانە ئایەتە حوکمی فلانە ئایەتەی لابردوەو (نَسْخ)ی کردۆتەوە، مەرج نیە مەبەستی زانایان بە وشەی (نَسْخ) هەمان مەبەستی باوی لای زانایانی (أصول الفقه) بووبێ، بۆ وێنە: کە ئایەتێك هاتوە، دوایی ئایەتەتێکی دیکەی بەدوادا هاتوەو گوتوویانە: ئەمەیان ئەوەی پێشێی (نَسْخ) کردۆتەوە، مەبەستیان ئەوە نەبووە کە حوکمەکەی لابرابێ، بەڵکو مەبەستیان ئەوە بووە کە ئەوەی پێشێ حوکمەکەی گشتی بووەو، ئەوەی دوایی تایبەتی کردوە، یاخود ڕەها بووەو مەرجداری کردوە، یاخود ڕووننەبووەو ئەوەی دوای ڕوونی کردۆتەوە، بەلام زانایانی دوایی هەر بەو چەمکەی خۆیان لەو وشەو تەعبیرانەی زانایانەی پێشین حاڵی بوون‌و، وایان زانیوە مەبەست پێیان ئەوەیە کە هەر ئایەتێك بە (ناسخ) دانرابێ، ئەوە حەتمەن لە بەرانبەریدا ئایەتێکی دیکە بە (مَنسوخ) دانراوەو حوکمەکەی لابراوە، کە لەڕاستیدا ئەوە بەهۆی هەڵە حاڵیبوونەوە بووە، لە چەك‌و پێناسەی زانایانی پێشین بۆ وشەی (نَسْخ).

کەواتە: ئەگەر (إحتمال)ی هەیە خوا ﷻ پێش ئەوەی قورئان بخرێتە نێو دوو بەرگەوەو، بە فەرمانی پێغەمبەر ﷺ سوورەتەکانی بەو شێوەیەو ئایەتەکانی بەو ڕێز بەندییە، کە ئێستا لەبەردەستمانە دەیبینین، بەو شێوەی لێ هاتبێ، خوا ﷻ هەندێك ئایەتی لابردبن، وە لەبیر پێغەمبەرو لەبیر مسوڵمانانیشی بردبنەوە،

وەك لە هەندێك فەرمایشتەكاندا ئەوە بەرچاو دەكەوێ، بۆ وێنە[1]: {عَنْ ابن شهاب، قَالَ: حَدَّثني أَبو أمامة بن سهل بن حُنَيفٍ في مَجلس سعيد بن الْمُسَيِّب أن رَجُلاً قَامَ مِنَ اللَّيل ليقرأ سورةً مِنَ القُرآن، فَلَمْ يَقْدِرْ عَلَى شَيءٍ مِنْهَا، وَقَامَ آخر فَلَمْ يَقْدِرْ عَلَى شَيءٍ مِنْهَا، وَقَامَ آخر فَلَمْ يَقْدِرْ عَلَى شَيءٍ مِنْهَا، فَغَدَوا عَلَى رسول الله ﷺ، فَقَالَ أَحَدهُمْ: قُمْتُ اللَّيل يَا رَسُول الله لأقرأ سورةً مِنَ القُرآن فَلَمْ أَقْدر عَلَى شَيءٍ، فَقَامَ الآخر، فَقَالَ: وَأَنَا كَذَلِكَ يَا رَسُول الله، فَقَالَ الآخر: وأنا وَاللهِ كَذَلِكَ يَا رَسُول اللهِ! فَقَالَ رَسُول الله ﷺ: (إِنَّهَا مِمَّا نَسَخَ اللهُ البَارِحَةَ) أَخْرَجَهُ الطَّبَرَانِي في (المعجم الكبير) (٢٨٨/٢١)، والهيثمي في (المجمع) (٣١٥/٦، ١٥٤/٧، ١٥٦)}.

وەك دەبینین: سێ لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ هەڵساون بۆ شەونوێژو ویستوویانە سوورەتێك لە قورئان بخوێنن، بەڵام نەیانزانیوە، چونكە لەبیریان چۆتەوە، پاشان كە چوونە لای پێغەمبەری خوا ﷺ، فەرموویەتی: ئەو سوورەتە لەوەیە كە دوێنێ شەو خوا لایبردوەو نەسخی كردۆتەوە، بەڵام بە هەرحاڵ ئەگەر ئەو ڕیوایەتانەش تێیاندا بگەینە قەناعەت[2]، كە كاتی خۆی هەندێك ئایەت هەبوون خوا ﷻ لایبردوون حوكمەكەی نەهێشتوون و لەبیر مسوڵمانانی بردوونەوە، ئەوە دیسان بەڵگەنیە لەسەر ئەوە كە، ئێستا لەو قورئانەی بەردەستماندایە ئایەتی لەو شێوەیە تێدابن، بەڵكو بەپێچەوانەوە بەڵگەیە لەسەر نەبوونی ئایەتی لەو جۆرە لە موصحەفی ئێستای بەردەستماندا، چونكە ئەگەر هەموویان لەبیریان چووبنەوە چۆن و لەلایەن كێوە كۆكراونەوەو پاشان نووسراونەتەوە ؟!!

---

١) (الجامع الأحكام القُرآن) للقرطبي، ج: (١)، ص: (٣٧١).

٢) بەڵام نایشارمەوە كە من ئەو گێڕراوانەم ناچنە عەقڵ و دڵمەوە، پێم وانیە ڕاست بن و شتی وا ڕوویدابێ، ئەگەرنا دەنگدانەوەو، ڕەنگدانەوەی زیاتری دەبوو.

## چەند نموونەیەك بۆ ڕوونبوونەوەی مەبەست

**نموونەی یەكەم:** حوكمێك كە ڕەها (مُطْلَق)بێ و دوایی بەنددار (مُقَیَّد) كرابێ:

لە سوورەتی (الشوری) ئایەتی (٢٠)دا، خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ مَن كَانَ يُرِيدُ حَرْثَ ٱلْأَخِرَةِ نَزِدْ لَهُۥ فِى حَرْثِهِۦ ۖ وَمَن كَانَ يُرِيدُ حَرْثَ ٱلدُّنْيَا نُؤْتِهِۦ مِنْهَا وَمَا لَهُۥ فِى ٱلْأَخِرَةِ مِن نَّصِيبٍ ﴾، (حَرْث) واتە: كێڵگە، كشتوكاڵ، بەڵام لێرەدا مەبەست پێی بەرهەمی دواڕۆژە، واتە: هەركەسێك بەرهەمی دوا ڕۆژی بوێ، ئەوا پێی دەدەین، وە هەركەسێك بەرهەمی دنیای بوێ، لە بەرهەمی دنیای دەدەینێ، بەڵام لە دواڕۆژدا هیچ بەشی نیە.

وەك دەبینین پێدانی بەرهەمی دنیا لێرەدا ڕەهایە، بەڵام دوایی لە سوورەتی (الإسراء) ئایەتی (٨)دا، دەفەرموێ: ﴿ مَّن كَانَ يُرِيدُ ٱلْعَاجِلَةَ عَجَّلْنَا لَهُۥ فِيهَا مَا نَشَآءُ لِمَن نُّرِيدُ ثُمَّ جَعَلْنَا لَهُۥ جَهَنَّمَ يَصْلَىٰهَا مَذْمُومًا مَّدْحُورًا ﴾، واتە: هەركەسێك ژیانی بەپەلەی دنیای بوێ، بۆ هەركەس كە بمانەوێ، ئەو ئەندازەیەی كە بمانەوێ پێی دەدەین، دوایی دۆزەخی بۆ دابین دەكەین، كە بە سەرزەنشتكراویی و بە بەزیویی دەخرێتە نێوی، لێرەدا خوا ﷻ ئەوەی كە لە ئایەتی (٢٠)ی سوورەتی (الشورى)دا هاتوە، كە دەفەرموێ هەركەسێك دنیای بوێ دەیدەینێ، لێرەدا {لە ئایەتی (١٨)ی سوورەتی (الإسراء)دا} بەنددارو مەرجداری دەكات بە: {هەركەسێك كە بمانەوێ}، واتە: مەرج نیە هەر كەسێك شتێكی ویست لە دنیادا خوا بیداتێ، بەڵكو ئەوەی كە خوا بیەوێ دەیداتێ، وە ئەو ئەندازەیەی خوا بیەوێ، كەواتە دوو مەرجی هەن: هەم لەسەر ئەندازەكە (یەكێك دەڵێ: خوایە پێم خۆشە ملیارێك دۆلارم بدەیە).

١- خوا بەو ئەندازەیە دەیداتێ كە خۆی دەیەوێ.

٢- وە دەشیدا بەو كەسەی كە خۆی دەیەوێ. (ئەگەر هەزار (١٠٠٠) كەس بڵێن:

خوایە سامانی زۆری دنیامان بدەیە، مەرج نیە بیدا بەهەر هەزارەکە)، دیارە ئایەتەکەی سوورەتی (الشوری)ش هەر هەمان مەبەستەکەی سوورەتی (الإسراء)ی ، هەیە بەڵام بۆ ئەوەی هیچ کەس بەهەڵەدانەچێ لە تێگەشتنیدا لە ئایەتەکەی (الإسراء)دا، ئەو مەرجانەی کە عەقڵو مەنتیقی سەلیم دەیانخوازێ، خستوونیە ڕوو.

**نموونەی دووەم:** حوکمێك کە گشتی (عَام)بێو دوایی تایبەت (تَخْصِیص) کرابێ:

خوای پەروەردگار لە سوورەتی (النور) ئایەتی (٢٧)دا دەفەرموێ: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَدْخُلُوا۟ بُيُوتًا غَيْرَ بُيُوتِكُمْ حَتَّىٰ تَسْتَأْنِسُوا۟ وَتُسَلِّمُوا۟ عَلَىٰٓ أَهْلِهَا ۚ ذَٰلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ ﴾، واتە: ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە ! مەچنە هیچ ماڵێك جگە لە ماڵەکانی خۆتان، هەتاکو مۆڵەت وەرنەگرن، وە سڵاو لە خەڵکی ئەو ماڵە نەکەن کە لێی دانیشتوون، ئا ئەوەتان بۆتان باشترە بەڵکو پەند وەربگرن.

لێرەدا ئەم ئایەتە حوکمەکەی گشتییە، واتە: هەرماڵێكو هەر خانوویەكو مەنزڵگایەك ویستت بچیە نێوی، دەبێ مۆڵەت وەربگری وسەلام لە خەڵکەکەی بکەی، ئەگەرنا دروست نیە بچیە نێوی، بەڵام دوایی خوا ﷻ هەر لە سوورەتی (النور) لە ئایەتی (٢٩)دا دەفەرموێ: ﴿ لَّيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَن تَدْخُلُوا۟ بُيُوتًا غَيْرَ مَسْكُونَةٍ فِيهَا مَتَـٰعٌ لَّكُمْ ... ﴾، واتە: گوناهتان ناگاتێ، ئەگەر بچنە هەر مەنزڵگایەکەوە کە خەڵکی تێدانەبێ، مادام ئیشێکتان هەبێ لەوێ. ئەوەی پێشێ بەگشتی فەرموویەتی: مەچنە هیچ ماڵێکەوە، بەڵام ئەوەی دوایی فەرموویەتی: گوناهتان ناگاتێ، ئەگەر بچنە هەر مەنزڵگایەکەوە کە خەڵکی تێدانەبێ، مادام ئیشێکتان هەبێ لەوێ، کەواتە ئەو مەنزڵگایانەی کە خەڵکیان تێدانیە، واتە: خەڵکێکی تایبەت وەك خێزان، بۆ وێنە: ئوتێلو شوێنە گشتییەکان، ئەوە گوناح نیەو پێویست بە سەلام کردن ناکات، بەمجۆرە ئەوەی دوایی حوکمە گشتییەکەی

ئەوەی پێشێی تایبەت (تَخْصِيص) کردوە بەو ماڵو خانووانەوە، کە کەسانێکی دیاریکراویان تێدایە.

هەروەها خوای پەروەردگار لە سوورەتی (النور)دا، دەفەرمووێ: ﴿ وَقُل لِّلْمُؤْمِنَٰتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَٰرِهِنَّ وَيَحْفَظْنَ فُرُوجَهُنَّ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا ...﴿٣١﴾ ﴾، واتە: وە بە ئافرەتانی بڕوادار بڵێ: لە چاوی خۆیان (لە ڕوانینی خۆیان) بگرنەوە {بە ئارەزوو تەماشای پیاوان نەکەن} وە داوێنی خۆیان بپارێزن، وە با جوانیی خۆیان دەرنەخەن، مەگەر ئەوەی بە ناچاریی دەردەکەوێ، جا (القُرطُبي) دەڵێ: (مَا يَظهَرُ عَادَةً وَعِبادَةً) کە مەبەست پێی دەموچاوو هەردوو دەستە، کە هەم لەکاتی عیبادەتدا، وەك نوێژو حەج دەبێ دەستو چاو دیاربن و، هەم بە عادەت لەکاتی کڕینو فرۆشتنو کاری ماڵەوەدا، ئافرەت دەستو دەمو چاوی دیارن، کەواتە لێرەدا بەگشتی وا دەفەرموێ، بەڵام دوایی لە ئایەتی (٦٠)ی هەر لە هەمان سوورەتدا، دەفەرموێ: ﴿ وَٱلْقَوَٰعِدُ مِنَ ٱلنِّسَآءِ ٱلَّٰتِى لَا يَرْجُونَ نِكَاحًا فَلَيْسَ عَلَيْهِنَّ جُنَاحٌ أَن يَضَعْنَ ثِيَابَهُنَّ غَيْرَ مُتَبَرِّجَٰتٍۭ بِزِينَةٍ ۖ وَأَن يَسْتَعْفِفْنَ خَيْرٌ لَّهُنَّ ۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿٦٠﴾ ﴾ النور، واتە: وە ئافرەتانێك کە دانیشتوون بە ئومێدی نیکاح نین، (واتە: ئافرەتی کامڵ، پیرەژن) ئەوانە گوناهیان ناگاتێ کە هەندێك لە پۆشاکیان دابنێن، بەمەرجێك بە ئانقەست جوانیی خۆیان دەرنەخەن، وە هەتا لەخۆیان وریابن باشترە بۆیان، وە خوا بیسەری زانایە. ئەوەی پێشێ بەگشتی فەرموویەتی کە نابێ ئافرەتان جوانیی خۆیان دەربخەن، بەڵام ئەوەی دوایی هاتوە تایبەتی کردوە، کە ئەوە بۆ ئافرەتانی گەنجو جوان وایە، ئەمما بۆ ئافرەتانی پیرەژنو کامڵ کە پیاوان بە تەمایان نینە، قەیدێناکە ئەگەر بەشێك لە بەرگو پۆشاك دابنێن، بۆ وێنە: کە گەرمای دەبێ سەر پۆشەکەی دابنێ بۆ ئیسراحەتی خۆی، با پیاوانیش چاویان لێبێ گوناهبار نابێ، بەس ئەو ئافرەتانەی زیاتر سەرنج ڕاکێشن بۆ پیاوان، دەبێ تەنیا دەستو چاویان دیاربێت،

ئەگەرنا ئافرەتانی دیکە، ئەگەر تۆزێ لە بەرگو پۆشاکیان سووك (تَخْفيف) بکەن، مادام بەو شێوەیە بن کە خوا دەفەرموێ: ﴿ وَٱلْقَوَٰعِدُ مِنَ ٱلنِّسَآءِ ٱلَّٰتِي لَا يَرْجُونَ نِكَاحًا ﴾، (قواعد) کۆی (قاعدة)یە، ئەمیش ئافرەتێکی پیرەژنە کە دانیشتوەو، وەك بڵێی لە هەموو شتێك بۆتەوە، بەتەمای پیاوان نیەو پیاو بەتەمای نین ئەوە ئەگەر زۆریش ئیحتیاط نەکات وەك ئافرەتێکی گەنج، قەیناکات.

**نموونەی سێیەم**: حوکمێك کە بە کورتیی (مُجمَل)ی هاتوەو، دوایی درێژە (تَفْصِيل)ی پێدراوەو روونکراوەتەوە:

وەك لە سوورەتی (البقرة) ئایەتی (٢٨٤)دا، خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ لِّلَّهِ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ ۗ وَإِن تُبْدُوا۟ مَا فِىٓ أَنفُسِكُمْ أَوْ تُخْفُوهُ يُحَاسِبْكُم بِهِ ٱللَّهُ ۖ فَيَغْفِرُ لِمَن يَشَآءُ وَيُعَذِّبُ مَن يَشَآءُ ۗ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴾، واتە: ئەگەر ئەوەی لەدڵتاندا هەیە ئاشکرای بکەن، یان پەنهانی کەن خوا لێتان دەپرسێتەوە ... لە (صحيح مُسلم)[1]دا هاتوە، کە کاتێك ئەم ئایەتە هاتە خوارێ هاوەڵانی بەرێزی پێغەمبەر ﷺ چوونە خزمەت پێغەمبەر ﷺ گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا، خوا هەرچی فەرمانێکی پێکردووین لە نوێژو رۆژووو جیهاد ... هەموومان کردوە، بەڵام ئێستا خوا ئایەتێکی ناردۆتە خوار بۆمان جێبەجێ ناکرێ، پێغەمبەر ﷺ یش فەرمووی: ئایا دەتانەوێ وەك قەومی مووسا بڵێن (**سَمِعْنَا** وعَصَينا)، واتە: بیستمان بەڵام بەقسەت ناکەین، بڵێن: ﴿ سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا ۖ غُفْرَانَكَ رَبَّنَا وَإِلَيْكَ ٱلْمَصِيرُ ﴾، واتە: بیستمان و بەقسەت دەکەین پەروەردگارمان لێمان ببوورەو بۆ لای تۆ دەگەڕێینەوە، ئەوانیش گوتیان: ﴿ سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا ۖ غُفْرَانَكَ رَبَّنَا وَإِلَيْكَ ٱلْمَصِيرُ ﴾، ئنجا ئایەتی دوایی هات، کە دەفەرموێ: ﴿ لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفْسًا إِلَّا

---

١) صحيح مسلم: (١٢٦)، والترمذي: (٢٩٩٢)، والنسائي: (١١٠٥٩)، وأحمد والحاكم وغيرهم.

وُسْعَهَا ... ﴾، واتە: خوا لە هیچ کەسێك داوا ناكات جگە ئەوەی لەتوانایدا هەیە، تۆ كە خەیاڵێكت بەدڵدادێت خەیاڵێكی خراپ، گومانێك، یان شتێكی خراپ، نیەتێكی خراپت بە دڵدادێ، بەڵام پێشی ڕازی نیو لە دڵی خۆتی دەردەكەی، لەسەری گوناهبار نابیو لێت ناپرسێتەوە لەسەری، كەواتە: ئایەتەكەی دوایی: ﴿ لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا ۚ لَهَا مَا كَسَبَتْ وَعَلَيْهَا مَا ٱكْتَسَبَتْ ۗ رَبَّنَا لَا تُؤَاخِذْنَآ إِن نَّسِينَآ أَوْ أَخْطَأْنَا ۚ رَبَّنَا وَلَا تَحْمِلْ عَلَيْنَآ إِصْرًا كَمَا حَمَلْتَهُۥ عَلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِنَا ۚ رَبَّنَا وَلَا تُحَمِّلْنَا مَا لَا طَاقَةَ لَنَا بِهِۦ ۖ وَٱعْفُ عَنَّا وَٱغْفِرْ لَنَا وَٱرْحَمْنَآ ۚ أَنتَ مَوْلَىٰنَا فَٱنصُرْنَا عَلَى ٱلْقَوْمِ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٢٨٦﴾ ﴾ البقرة، كە لە (مسند الأمام أحمد)و (صحيح مسلم) و هی دیكەشدا هاتوە: هەر وشەیەك لێرەدا ئینسان بیڵێ، خوا ﷻ دەفەرموێ: (قَد فَعَلَتُ) ئەوە قبووڵم كرد[1]، ئەو ئایەتەی پێشێ كە لێڵییەكی تێدابووە لەبەرچاوی هاوەڵان خوا لێیان ڕازی بێ، ڕوونی كردۆتەوەو لێڵییەكەی نەهێشتوە، كە بریتی بوو لەچی؟ ئەوان پێیان وابووە كە خوای زاناو شارەزا هەرخەیاڵێكیان بە دڵدا بێت، بەبێ ئەوەش كە عەزمی لەسەر جەزم بكەن، خوا هەر لێیان دەپرسێتەوەو سزایان دەدا لەسەری، بەڵام خوای بە بەزەیی لە ئایەتەكەی دواییدا ڕوونی دەكاتەوە كە هیچ كەسێك خوا داوای لێ ناكات جگە ئەوەی لەتوانایدا هەیە، جا ئینسان لەتوانایدا نیە هیچ خەیاڵێكی خراپی بەدڵدا نەیەت، بەڵام لەتوانایدا هەیە عەزمی لەسەر جەزم نەكاو دڵی خۆی لەسەر نەچەسپێنێ، وەك پێغەمبەری خواش ﷺ لەوبارەوە فەرموویەتی: {(إِنَّ اللَّهَ تَجَاوَزَ لِي عَنْ أُمَّتِي مَا وَسْوَسَت بِهِ صدُورُهَا، مَا لَمْ تعْمَلْ أَو تَكَلَّمْ) (رَوَاهُ البُخَارِيُّ برقم: (٢٥٢٨)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٣٢٧)، وَالنَّسَائِيُّ برقم: (٣٤٣٥)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٢٢٠٩) وَغيرهم، عَنْ أَبِي هُرَيرَةَ رضي الله عنه}، واتە: بێگومان خوا چاوپۆشیی بۆ لە ئۆممەتم كردووم، ئەوەی كە لەسینەیاندا خوتخوتە دەكات، بەمەرجێك كردەوەی پێنەكاتو بە قسە نەیدركێنێ.

---

١) أحمد: (١/٢٠٧٠) و (١/٣٠٧٠)، مسلم، (١٢٦)، الترمذي: (٢٩٩٢)، النسائي (١١٠٥٩).

**نموونەی چوارەم:** زەمینەی ئیشپێکردنی ئەو ئایەتانە، ئایا ڕەخساوە، یان نەڕەخساوە؟

جاری وا هەیە خوا پەروەردگار ئایەتێك یان زیاتر دەنێرێتە خوار، بەڵام زەمینەی ئیشپێکردنی نەڕەخساوە، با لەوبارەوە گوێ لەم قسەیە بگرین: ((قَالَ: قَتَادَةَ بن دعامة الدوسي التّابعي: كُلُّ شَيء في القُرآن: فأعْرِض عَنهُم وانتظِر، مَنسوخ نَسخَتْهُ بَرَاءَة و القِتَال))[1]، واته: قەتادە کە یەکێکە لە تابعین دەڵێ: هەر شتێك کە لە قورئاندا هاتوە (فأعْرِض عَنهُم) (وانتظِر) یانی: (پشت لە کافرەکان بکە)و (چاوەڕێ بە)، هەمووی (نَسْخ) بۆتەوە بە سوورەتی (بَرَاءَة) و (القِتَال)، جا دیارە مەبەستی قەتادە ئەوە نیە کە (نَسْخ) بۆتەوەو ئیشی پێ ناکرێ، بەڵکو مەبەستی ئەوەیە دوای ئەوەی، کە جەنگ و جیهاد لەسەر مسوڵمانان پێویست بووە، ئەو ئایەتانەی کە پێشتر بە پێغەمبەریان ﷺ فەرمووە: چاوەڕێ بکەو لێیانگەڕێ، ئەوانە ئیشیان پێ ناکرێ، چونکە ئایەتی دیکە هاتۆتە پێش و مسوڵمانان چوونەتە قۆناغێکی دیکەوە، واتە ئایەتێك لە قۆناغێکدا بەجۆرێك مسوڵمانان دەدوێنێ، لەبەرئەوەی هەر ئەوەندەیان لەتوانادا هەیە، لە قۆناغێکدا خوای کاربەجێ تەنیا ئیمانی لەسەر مسوڵمانان پێویست کردوە، بەڵام دوایی لەسەری پێویست کردوون جەنگیش بکەن، ئنجا دیارە کە جەنگیان لەسەر پێویست بوو، مانای وانیە ئەو ئایەتانەی کە داوایان لێکردوون ئیمان بێنن و، تەماشای مەلەکووتی خوا بکەن و، بەزەویدا بڕۆن، وە داوایان لێکردوون کە تەزکیەی نەفسی خۆیان بکەن، مانای وانیە ئەو ئایەتانە (نَسْخ) بوونەوە، بەڵکو واتە: ئێستا مسوڵمانان چوونەتە قۆناغێکی دیکەوەو ئەرکێکی دیکەیان چۆتە سەرشان، ئەگەرنا ئەویدیکەشیان هەر لەسەرشانە، وە کەسانێك کە توانایان نەبێ جەنگ و جیهاد بکەن، بەدڵنیایی یەوە، ئەو ئایەتانەی پێشێ کە

---

١) (أَخرَجَهُ ابنُ الجَوزي في (نَواسِخ القُرآن)، ص(٢١٢) و عبدالله بن يوسف الجُديع في (المقَدِّمات الأساسِيَّة في عُلوم القُرآن، ص: (٢١٢)، وقَالَ: أثَر الصَحيحٌ).

فـەرمان دەکـەن بـە ئیمـانو بـە طـاعـەتو تـەقواو بـە جێبـەجێکردنی ئەرکـە شەخصییەکان، هەر ئەوەندەیان لەسەر پێویستە.

(الزرکـشـي) لـەوبارەوە دەڵـێ: ((مَـا أُمِـرَ بِـهِ لِسبَـبٍ ثُـمَّ يَـزُولُ الـسَّبَب، كَـالأمرِ حِينَ الضُّعْفِ و القِلَّةِ بالـصَّبـر والـمَغْـفِرَة لِلَّذِينَ لاَيَرجُونَ لِقَـاءَ اللهِ و نَحوه مِنْ عَدَم إيجَـاب الأمر بِالـمَعروفِ والنَّـهيُ عَنِ الـمُنْكَر و الجِهَـاد وَنَحْوِهَـا ثُـمَّ نَـسَخهُ إيجَـابُ ذَلِـكَ، وهَذَا لَيْسَ بنَسخٍ فـي الحَقِيقَـة وإنَّما هُوَ نَسْأٌ كَمَا قَالَ تَعالـى: ﴿ أَوْ نُنسِهَا ﴾ فَالْمُنْسَـأ هُـوَ الأمـر بالقِتَـال إلـى يَقـوَى الـمُسلِمُون وفـي حَـالِ الـضُّعْف يَكُونُ الحُكم وجُوب الـصَّبر عَلَـى الأَذى وبِهَـذَا التَحقِيق يَتَبَيَّنُ ضعفُ مالـهِجَ بهِ كَثيـرٌ مِنَ الـمُفَسرِين في الآيات الآمِرَة بالـصَّبْر: أَنَّهَا مَنسُـوخَة بآيةِ السَّيف، ولَيْسَتْ كَذَلك))[1] لێرەدا زەرکەشیی قسەیەکی زۆرجوان دەکات، دەڵێ: هەرشتێك لـە قورئانـدا خـوا فـەرمانی پێکـردوە لەبـەر هۆیـەك، دوایـی هۆیەکـەی لاچوو، مانـای وا نیـە کـە (نَـسْخ) بۆتـەوە، دەڵـێ بـۆ وێنـە: کاتـێ مـسوڵمانان کـەم بـوونو بێهێزبـوون، خـوا فـەرمانی پێکـردوون ئـارامبگرن، وە فـەرمانی پێکـردوون چاوپۆشیی لەوانە بکەن کە بە ئومێدی ڕۆژی دوایـی نـینو کـافرن، هـەروەها وەك ئەوە کە فـەرمان بەچاکەو ڕێگەگرتن لـە خراپـەو جیهـاد لـە ڕێـی خـوادا پێـشتـر فـەرمانیان پـێ نـەکراوە، بـەڵام دوایـی فـەرزکراون، جـا لەڕاسـتیدا ئـەوە، لابـردن (نَـسْخ)نیـە بـەڵکو دواخـستن (نَـسْأ)ە، واتـە: دواخـستن، وەك دەفـەرموێ: (أَو نُنْسِئْها) {بەپێی ئەو قیـرائەتەی کە هەندێك لە قاریيەکان پێیان خوێندۆتـەوە}، واتە: یان دوای دەخەینو جارێ لەسەرتان پێویست ناکەین، جا دەڵێ: (فالـمنسأُ هُوَ الأمر بالقِتَال إلى يَقوى الـمُسلِمُون)، واتە: کەواتە دواخراو (مُنْسَأ) بریتیە لە فەرمانکردن بە جەنگ تـا مـسوڵمانان دەستەڵاتیان پەیدادەبـێ، ئـەو کاتـە خـوا ﷻ فـەرمان بـە جـەنگو جیهـاد دێنێتـە خـوارێ {لـەپێش ئـەوەدا مـسوڵمانان چییان لەسـەر پێویستـە؟ ئارامگرتن، دوایی کە دەستـەڵاتیان هەبوو دەبێتە قۆنـاغی زەبـر،

---

١) (البُرهَان في علُوم القُرآن)، ج: (٢)، ص: (٤٢).

ئەگەر زەبرت نەبوو دەبێ صەبرت هەبێت)[1] جا دەڵێ: بەو لێکۆڵینەوەیە ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ کە ئەوەی زۆر لە توێژەرەوان بە (نَسْخ)ی دادەنێن، کە بریتیە لە فەرمانکردن بە خۆڕاگریی و دان بەخۆداگرتن لەگەڵێك ئایەتاندا، کە گوایە بە ئایەتی (شمشێر) نەسخ کراونەتەوە، ڕاست نیە.

بەڵکو ئەوە خوای پەروەردگار هەندێ لەو حوکمانەی بۆ قۆناغێك ناردوون، دوایی قۆناغێکی دیکە هاتۆتە پێش، جا هەتا ئەو قۆناغەی کە حوکمەکەی بۆ نێرراوەتە خوار، نەیەتەوە پێش ئەو حوکمە کاری پێناکرێ، بەڵام ئەوە مانای ئەوەنیە کە ئەو حوکمەی شەریعەت نەماوەو هەڵگیراوە، بەڵکو تەنیا ڕاگیراوە بە شێوەیەکی کاتیی و، هەرکاتێ مسوڵمانان کەوتنەوە ئەو هەلومەرج و قۆناغەوە، ئەو ئایەتەو ئەو حوکمە شەرعییە ڕوویان تێدەکاتەوە، بۆ وێنە: ئێستا ئەگەر ئێمە ئارام نەگرین و پشوومان درێژ نەبێ و صەبر لەسەر ئازاری ئەهلی کوفرو نیفاق نەگرین، دەبێ چی بکەین؟ بێگومان دەبێت جەنگێ بکەین کە فەرمانمان پێنەکراوە، بۆچی؟ چونکە هەلومەرجی بۆ نەڕەخساوەو، مەرجە شەرعییەکانی بۆ نەهاتوونە دیو زەرەری لە قازانجی زیاترە، وەك پێغەمبەر ﷺ کە لە قۆناغی مەککەدا هاوەڵانی بەڕێزی پێیان دەگوت: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا جەنگ لەگەڵ کافرەکاندا نەکەین؟ لە وەڵامدا دەیفەرموو: ((لَمْ نُؤمر بِذلِكَ))[2]، واتە: فەرمانمان بە جەنگ پێنەکراوە، نەیدەگوت هەرنابێ بیکەین، بەڵکو دەیگوت: ئێستا وەختی نیەو هەلومەرجی بۆ نەڕەخساوە.

**__نموونەی پێنجەم:__** پلەپلەیی لە دابەزینی دەقەکان و حوکمە شەرعییەکاندا:

نموونەیەکی دی مەسەلەی پلەپلەیی یە لە دابەزینی حوکمە شەرعییەکاندا، بۆ وێنە: خوا ﷻ شەرابی بە چوار قۆناغ قەدەغە کردوە:

---

١) ئەوەی نێوان دوو کەوانەکەم خۆم زیادم کردوە، بۆ ڕوونبوونەوەی مەبەست.

٢) بڕوانە: (السيرة النبوية) لإبن هشام، ج: (٢)، ص: (٢٣١)، صَحَّحَهُ ابنُ حِبَّان و صَحَّحَهُ الألباني في تخريجه لأحاديث (فقه السيرة) لمحمد الغزالي.

١/ لە قۆناغی یەکەمدا لە سوورەتی (النحل)دا دەفەرموێ: ﴿ وَمِن ثَمَرَٰتِ ٱلنَّخِيلِ وَٱلۡأَعۡنَٰبِ تَتَّخِذُونَ مِنۡهُ سَكَرٗا وَرِزۡقًا حَسَنًا ...﴿٦٧﴾ ﴾، واتە: لە میوەی خورماو ترێ ماددەی سەرخۆشکەری لێ دروست دەکەن، لەگەڵ بژێویێکی باش، ئەمە ئاماژەیە بەوە کە ماددەی سەرخۆشکەر، کە بریتیە لەو شەرابەی لە ترێو خورما دروست دەکرێ، شتێکی باش نیە، چونکە خوا دەفەرموێ: ماددەی سەرخۆشکەری لێ دروست دەکەن لە بەرهەمی میوەو خورما لەگەڵ ڕزقێکی باش، کەواتە: دیارە شەڕاب ڕزقێکی خراپە، ئەوە تەنیا ئاماژەیە، ئەوە قۆناغی یەکەم.

٢/ لە قۆناغی دووەمدا لە سوورەتی (البقرة)دا دەفەرموێ: ﴿ يَسۡـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلۡخَمۡرِ وَٱلۡمَيۡسِرِۖ قُلۡ فِيهِمَآ إِثۡمٞ كَبِيرٞ وَمَنَٰفِعُ لِلنَّاسِ وَإِثۡمُهُمَآ أَكۡبَرُ مِن نَّفۡعِهِمَا ... ﴿٢١٩﴾ ﴾، واتە: پرسیارت لێدەکەن دەربارەی شەڕابو قومار بڵێ: گوناهێکی گەورەیان تێدایە، هەندێ سوودو بەرژەوەندیش بۆ خەڵك، بەڵام گوناهەکەیان گەورەترە لە قازانجەکەیان... ئەوەش ئاماژەیەکی دیکەیە کە قومارو شەڕاب شتێکی خراپن، وە گوناهیان زیاترە لە سوودیان، کە سوودەکەشیان بەس بریتی بووە لە سوودی بازرگانیی پێکردن، ئەوە قۆناغی دووەم.

٣/ لە قۆناغی سێیەمو لە سوورەتی (النساء)دا، دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَقۡرَبُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَنتُمۡ سُكَٰرَىٰ حَتَّىٰ تَعۡلَمُواْ مَا تَقُولُونَ ﴿٤٣﴾ ﴾، واتە: ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە! بە سەرخۆشیی توخنی نوێژ مەکەون، هەتا دەزانن چی دەڵێن، واتە: بە سەرخۆشیی نوێژی مەکەن، ئەوە قۆناغی سێیەم.

٤/ وە لە قۆناغی چوارەمو کۆتایی لە سوورەتی (المائدة)دا، خوای بەرزومەزن بە یەکجاری حوکمێکی ڕوون دەنێرێتە خوار دەربارەی شەڕابو دەفەرموێ:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّمَا ٱلۡخَمۡرُ وَٱلۡمَيۡسِرُ وَٱلۡأَنصَابُ وَٱلۡأَزۡلَٰمُ رِجۡسٞ مِّنۡ عَمَلِ ٱلشَّيۡطَٰنِ

فَٱجۡتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ﴿٩٠﴾﴾، واتە: ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە شەڕاب و قومارو بتەکان و، زەلەمەکان، {(أزلام) کۆی (زَلَم)ە و شتێك بووە بۆ یانسیب بەکاریان هێناوە} هەموو ئەوانە پیسن لە کردەوەی شەیتانن، لێیان دووربکەونەوە. ئیدی بە یەکجارەکیی لەم قۆناغی چوارەمەدا خوای کاربەجێ قومارو شەڕابی قەدەغە کرد.

أَحْمَد، وأَبُو دَاوُدَ، والتِّرمِذِي، والنَّسَائِي، والبَيهقي، وابن جرير وابن أبي حاتِم)[1] گێڕاویانەتەوە کە کاتێك ئەم ئایەتە هاتە خوارێ: ﴿يَسۡـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلۡخَمۡرِ وَٱلۡمَيۡسِرِۖ... ﴿٢١٩﴾ البقرة﴾، بردیان بۆ لای عومەر خوا لێی ڕازی بێ، گوتیان: خوا ئەمەی دەربارەی شەڕاب ناردۆتە خوارێ، گوتی: ((اللَّهُمَّ بَيِّن لَنَا فِي الخَمْرِ بيَاناً شِفَاءً))، واتە: خوایە دەربارەی مەی (خَمْر) ڕوونکردنەوەیەکمان بۆ بنێرە، کە تەواو شیفای دڵمان بدات، هەروەها کاتێك ئایەتی: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَقۡرَبُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَنتُمۡ سُكَـٰرَىٰ حَتَّىٰ تَعۡلَمُواْ مَا تَقُولُونَ ﴿٤٣﴾﴾ النساء، هاتە خوارێ، دیسان عومەر خوا لێی ڕازی بێ هەمان دووعای کرد، دوایی کە ئایەتی: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّمَا ٱلۡخَمۡرُ وَٱلۡمَيۡسِرُ وَٱلۡأَنصَابُ وَٱلۡأَزۡلَـٰمُ رِجۡسٌ مِّنۡ عَمَلِ ٱلشَّيۡطَـٰنِ فَٱجۡتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ﴿٩٠﴾﴾ المائدة، هاتە خوار، عومەر خوای لێی ڕازی بێ، گوتی: ((اللَّهُمَّ انتَهَيْنا انتَهَيْنا))، واتە: ئەی خوایە ! وازمان هێنا، وازمان هێنا.

جا لێرەدا هەندێك لە توێژەرەوانی قورئان گوتوویانە: ئەو ئایەتەی کۆتایی کە لە سوورەتی (المائدة)دا هاتوە، هەموو ئایەتەکانی پێشێی (نَسْخ) کردوونەوە! بەڵام لە ڕاستیدا وانیەو، هیچ پێویست بە باسکردنی نەسخ ناکات، چونکە خوا لە ئایەتەکەی سوورەتی (النحل)دا دەفەرموێ: بەرهەمی خورماو ترێ، شەڕاب و

---

١) مسند أحمد: (١/٣٧٧)، أبو داود: (٣٦٧٠)، الترمذي: (٣٠٤٩)، النسائي في المجتبى: (٥٥٥٥)، البيهقي: (٨/٢٨٥)، والحاكم والبزار وغيرهم عن عمر بن الخطاب ﷺ وصحَّحَهُ الألباني.

ڕزقێکی باشی لێ دروست دەکەن، کە دیارە ئەوەش وایەو، ئەوە پێویستی بە (نَسْخ) ناکات، خوا بەیانی شتێك دەکات کە لە واقیعدا هەیە، ئنجا ئەویدیکەش کە دەفەرموێ: دەربارەی شەرابو قومار پرسیارت لێ دەکەن بڵێ: گوناهێکی گەورەیان تێدا هەیەو هەندێ سوودی خەڵکیش، کە دیارە ئەوەش هەر بەیانی واقیعەو شەرابو قومار، گوناهێکی گەورەو هەندێ سوودو بەرژەوەندییان تێدایە کە بازرگانیی پێکردنیانە.

ئەوەی سێیەمیشیان کە دەفەرموێ: بە سەرخۆشیی نوێژ مەکەن ! پێویست ناکات بڵێین (نَسْخ) بۆتەوە، چونکە ئێستاش وەنەبێت بە سەرخۆشیی نوێژکردن ڕەوا بێت ! بە سەرخۆشیی نوێژکردن هەر خراپە، وە ئەمەش ئەوە ناگەیەنێ کە ئەو ئایەتە ئەوە دەگەیەنێ کە شەراب حەرام نیەو، بەس گرنگ ئەوەیە بە سەرخۆشیی نوێژ نەکەی ! چونکە حەرامیی شەراب لە ئایەتی سووڕەتی (المائدة)دا دەردەکەوێ، بەڵام بە سەرخۆشیی نوێژ کردن قەدەغە بوون، لە ئایەتەکەی سووڕەتی (النساء)دا دەردەکەوێ.

**نموونەی شەشەم:** پێویستبوونی هەندێك ئەرك بە چەند قۆناغێك، هەر جارە بەشێکی یان جۆرێکی:

مەسەلەیەکی دیکە هەر لەوبارەوە، ئەوەیە کە خوا ﷻ جاری وایە شتێکی بە چەند قۆناغێك لەسەر مسوڵمانان فەرز کردوە، بۆ نموونە: جەنگو جیهاد:

١/ لە قۆناغی یەکەمدا خوا ﷻ فەرمووی: ﴿ أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ قِيلَ لَهُمْ كُفُّوٓا۟ أَيْدِيَكُمْ وَأَقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُوا۟ ٱلزَّكَوٰةَ فَلَمَّا كُتِبَ عَلَيْهِمُ ٱلْقِتَالُ إِذَا فَرِيقٌ مِّنْهُمْ يَخْشَوْنَ ٱلنَّاسَ كَخَشْيَةِ ٱللَّهِ أَوْ أَشَدَّ خَشْيَةً ﴿٧٧﴾ ﴾ النساء، واتە: تەماشا ئەوانە ناکەی کە پێیان گوترا دەستی خۆتان بگێڕنەوەو نوێژ بکەنو زەکات بدەن، جا کاتێك جەنگیان لەسەر پێویست کرا کۆمەڵێکیان لە خەڵکی دەترسن وەك چۆن لە خوا دەترسن، (واتە: پێیان ناخۆش بوو)، ئەوە قۆناغی یەکەم بوو کە خوا فەرمووی: جارێ جەنگ مەکەن.

٢/ لە قۆناغی دووەمدا، خوا ﷻ فەرمووی: ﴿ أُذِنَ لِلَّذِينَ يُقَـٰتَلُونَ بِأَنَّهُمْ ظُلِمُوا۟ ... ﴿٣٩﴾ ﴾ الحج، واتە: مۆڵەت درا بەوانەی کە زوڵمیان لێ دەکرێ، دیارە مۆڵەت درا، یانی: لەسەریان فەرز نیە، بەلام بۆیان هەیە، ئەوە قۆناغی دووەم.

٣/ وە لە قۆناغی سێیەمدا خوا ﷻ فەرمووی: ﴿ وَقَـٰتِلُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ٱلَّذِينَ يُقَـٰتِلُونَكُمْ وَلَا تَعْتَدُوٓا۟ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْمُعْتَدِينَ ﴿١٩٠﴾ ﴾ الحج، واتە: ئەوانەی لە دژتان دەجەنگن لە ڕێی خوادا لە دژیان بجەنگن، بەلام دەستدرێژیی مەکەن بێگومان خوا دەستدرێژکارانی خۆشناوێن. کەواتە: لێرەشدا پێویست ناکات بڵێین: ئایەتەکانی فەرزبوونی جەنگ‌و جیهاد ئەوانەی پێشێ بەوانەی دوایە (نَسْخ) بوونەتەوە، چونکە مسوڵمانان هەرکاتێك توانایان نەبوو، ئەگەر کافر زوڵمیشیان لێ بکات هەر دەبێ دەستی خۆیان بگێڕنەوەو صەبر بگرن‌و، ئنجا دوایی کە توانایان هەبوو، بەلام تواناکەیان هێندە نەبوو چاك قۆڵی لێ هەڵبکەن، ئەوە تەنیا مۆڵەتەو بۆیان هەیە جەنگ‌و جیهاد بکەن، بەلام لەسەریان فەرزنیە، بەلام دوایی هەرکات لە توانایاندا هەبوو لەسەریان پێویستە، کەواتە: هیچ ناکۆکیی‌و تێکگیرانێك لە نێوان ئەو سێ حوکمەدا نیە، تاکو ناچاربین بڵێین: (ناسخ)و (مَنْسوخ)ن، بەڵکو هەرکامێکیان بۆ قۆناغ‌و هەلومەرجێکی تایبەت‌و جیاواز لەوانی دیکەیە.

## توێژینەوەیەك لەبارەی ئایەتی شمشێرەوە

لە کۆتاییدا بە پێویستی دەزانم شتێك بڵێم دەربارەی ئەوە، کە توێژەرەوانی قورئان پێی دەڵێن: (آية السيف) {ئایەتی شمشێر} کە بریتیە لە ئایەتی ژمارە (٥) پێنجی سوورەتی (التوبة) کە بە سوورەتی (براءة)ش ناسراوە، کە ئەمە دەقەکەیەتی: ﴿ فَإِذَا ٱنسَلَخَ ٱلْأَشْهُرُ ٱلْحُرُمُ فَٱقْتُلُوا۟ ٱلْمُشْرِكِينَ حَيْثُ وَجَدتُّمُوهُمْ وَخُذُوهُمْ وَٱحْصُرُوهُمْ وَٱقْعُدُوا۟ لَهُمْ كُلَّ مَرْصَدٍ ۚ فَإِن تَابُوا۟ وَأَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَوُا۟ ٱلزَّكَوٰةَ فَخَلُّوا۟

سَبِيلَهُمْۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴾، واتە: ئەگەر مانگە قەدەغەكان، {واتە: ئەو مانگانەی جەنگیان تێدا قەدەغەكراوە} بەسەرچوون هاوبەش پەیداكەرەكان بكوژن لە هەر شوێنێك وەبەرپەلتان كەوتن، وە بیانگرن و ئابلۆوقەیان بدەن، وە لە هەموو شوێنێك بۆسەیان بۆ دابنێن، جا ئەگەر پەشیمانبوونەوە بۆلای خواو نوێژیان بەرپا كردو زەكاتیاندا، ئەوە ڕێیان چۆڵ بكەن و بەریانبدەن، بێگومان خوا لێبوردەی بەبەزەیی یە.

بەلام ئەگەر تەماشای سیاقی ئەو ئایەتانە یەكێك لە زانایان بەناوی (هبة الله بن سلامة البغدادي) لە كتێبی (الناسخ والمنسوخ)دا دەڵێ: ئەم ئایەتە (١٢٤) ئایەتی (نَسْخ) كردۆتەوە، وە هەندێكی دیكەش لە زانایان گوتوویانە: ((إنَّ كُلَّ مَا فِي القُرْآن مِثل: أَعْرِض، وتولّ عَنهُم، وذَرْهُم، وَمَا أشْبَه ذَلِكَ، فَنَاسِخُهُ آيَةُ السيف))، واتە: هەموو ئەو فەرمانانەی كە لە قورئاندان، وەك: وازیان لێبێنەو، پشتیان تێبكەو، لێیان بگەڕێو وێنەی ئەوانە، ئایەتی شمشێر هەمووی هەڵوەشاندوونەوە، بۆچی؟ دەڵێن: چونكە ئەم ئایەتە موبارەكە كە پێی دەڵێن ئایەتی شمشێر، فەرمان دەكات بە مسوڵمانان كە لەگەڵ موشریكەكاندا بجەنگن، دوای بەسەرچوونی ئەو چوار مانگە، كە جەنگیان تێدا قەدەغە كراوە !

بەلام ئەگەر تەماشای سیاقی ئەو ئایەتانە بكەین، كە لە سەرەتای سوورەتی (التوبة)وەن، زۆر بە ڕوونیی دیارە، كە ئەو تێگەیشتنە ڕاست نیە، سەرەتا خوا ئاوا دەفەرموێ: ﴿ بَرَآءَةٌ مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦٓ إِلَى ٱلَّذِينَ عَٰهَدتُّم مِّنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿١﴾ ﴾، واتە: ئەمە دەربڕینی حاشا لێكردنە لە خواو پێغەمبەرەكەیەوە ﷺ بۆ ئەو هاوبەش بۆ خوا دانەرانەی كە پەیمانتان لەگەڵیاندا هەیە، كە وەك لە سیاقی ئایەتەكەی دوایی دەیزانین، ئەوانەن كە بە پەیمانەكەیانەوە پابەندنین و هەرچەندە پەیمانیان لەگەڵ مسوڵماناندا هەیە، بەلام هەر دەرفەتیان بۆ ڕێكبكەوێ، زەرەر لە مسوڵمانان دەدەن و خیانەتیان لێ دەكەن، پاشان لە ئایەتی دووەمدا دەفەرموێ:

﴿ فَسِيحُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّكُمْ غَيْرُ مُعْجِزِى ٱللَّهِ ۙ وَأَنَّ ٱللَّهَ مُخْزِى ٱلْكَٰفِرِينَ

(٢) ﴾ التوبة، واتە: چوار مانگ مۆڵەتە بە زەویدا بڕۆن ئازادبن {ئەی هاوبەش بۆ خوا دانەرەكانو ئەو كافرانەی كە پەیمانتان لەگەڵ مسوڵمانانندا هەیە، بەڵام بە پەیمانەكەوە پابەند نین، چوار مانگ مۆڵەتە بڕۆن} وە بزانن كە ئێوە خواتان پێ دەستەوسان ناكرێ، وە خوا كافران سەرشۆڕ دەكات، ئنجا لە ئایەتی سێیەمدا دەفەرموێ: ﴿ وَأَذَٰنٌ مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦٓ إِلَى ٱلنَّاسِ يَوۡمَ ٱلۡحَجِّ ٱلۡأَكۡبَرِ أَنَّ ٱللَّهَ بَرِيٓءٞ مِّنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ وَرَسُولُهُۥۚ فَإِن تُبۡتُمۡ فَهُوَ خَيۡرٞ لَّكُمۡۖ وَإِن تَوَلَّيۡتُمۡ فَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّكُمۡ غَيۡرُ مُعۡجِزِي ٱللَّهِۗ وَبَشِّرِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِعَذَابٍ أَلِيمٍ (٣) ﴾ التوبة، واتە: ئەمە ئاگاداركردنەوەیە لە خواو لە پێغەمبەرەكەیەوە ﷺ بۆ خەڵك لە ڕۆژی حەجی گەورەدا (واتە: ڕۆژی ڕاوەستانی عەرەفە) كە خواو پێغەمبەری خوا بەریئنو هیچ پەیوەندییان نیە بە هاوبەش دانەرانەوە، جا ئەگەر گەڕانەوە (چ لە شیرك گەڕانەوە بۆ ئیمانو تەوحید، چ لە خیانەتو پەیمان شكاندنەوە گەڕانەوە بۆ ئیلتیزام بە پەیمان)، ئەوە بۆ ئێوە چاكترە، وە ئەگەر پشتتان هەڵكرد، ئەوە بزانن كە ئێوە خواتان پێ دەستەوسان ناكرێو دەرباز نابن لەدەستی خوا، وە مۆژدە بدە بەوانەی بێبڕوان بە سزایەكی بە ئێشو ژان، پاشان لە ئایەتی چوارەمدا دەفەرموێ: ﴿ إِلَّا ٱلَّذِينَ عَٰهَدتُّم مِّنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ ثُمَّ لَمۡ يَنقُصُوكُمۡ شَيۡـٔٗا وَلَمۡ يُظَٰهِرُواْ عَلَيۡكُمۡ أَحَدٗا فَأَتِمُّوٓاْ إِلَيۡهِمۡ عَهۡدَهُمۡ إِلَىٰ مُدَّتِهِمۡ ...(٤) ﴾ التوبة، واتە: جگە لەو هاوبەش دانەرانەی كە پەیمانتان لەگەڵیاندا بەستوەو، هیچ كەموكوورییان نەبووە لە پەیمانیان لەگەڵ ئێوە داو، هاوكاریی هیچ دوژمنێكی ئێوەشیان نەكردوە لە دژی ئێوە، ئەوانە پەیمانیان لەگەڵ تەواوبكەن تا وەختی خۆی، كەواتە: ئایەتەكەی پێشێ كە دەفەرموێ: ﴿ بَرَآءَةٞ مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦٓ إِلَى ٱلَّذِينَ عَٰهَدتُّم مِّنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ (١) ﴾ التوبة، مەبەست پێی ئەو موشریكانەیە كە پەیمانیان لەگەڵ مسوڵمانان هەیە، بەڵام پێوەی پابەندنین، بەڵام ئەوانەی كە بە پەیمانەكەیانەوە پابەندن: ﴿ فَأَتِمُّوٓاْ إِلَيۡهِمۡ عَهۡدَهُمۡ إِلَىٰ مُدَّتِهِمۡ ﴾، واتە: پەیمانیان

لەگەڵ تەواو بکەن، تا ئەو کاتەی کە بڕیارتـان داوە پێکەوە شەڕ نەکەن ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُتَّقِينَ ﴾، واتـە: بێگومـان خـوا پارێزکـارانی خۆشـدەوێ، ئنجـا لـە ئایـەتی پێنجەمدا دەفەرموێ: ﴿ فَإِذَا ٱنسَلَخَ ٱلْأَشْهُرُ ٱلْحُرُمُ فَٱقْتُلُوا۟ ٱلْمُشْرِكِينَ حَيْثُ وَجَدتُّمُوهُمْ وَخُذُوهُمْ وَٱحْصُرُوهُمْ وَٱقْعُدُوا۟ لَهُمْ كُلَّ مَرْصَدٍ ۚ فَإِن تَابُوا۟ وَأَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَوُا۟ ٱلزَّكَوٰةَ فَخَلُّوا۟ سَبِيلَهُمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ۝٥ ﴾ التوبـة، واتـە: جـا ئەگـەر ئـەو چـوار مانگـە بەسەرچـوون، کـە جـەنگیان تێـدا قەدەغـەکراوە، {لەگـەڵ ئـەو موشریکانەدا کە پەیمانتان لەگەڵیان هەیەو، ئازادییان دراوەتێ بۆ ئـەوەی بیـر لـە وەزعـی خۆیان بکەنەوە داخۆ مسوڵمان دەبن، یان پابەند دەبن بە پەیمانـەوە، یـان نـا ؟! کەواتە: ئەو موشـریکانەی کە دەبێ بکوژرێن کامانەن؟! ئەوانـەن کـە پـەیمان دەشـکێنن و پابەندنـین بـە پەیمانەکەیانـەوە}، ئـەوە هاوبـەش بـۆ خوادانـەرەکان لـە هـەر شـوێنێك بەردەسـتتان کـەوتن، بیـانکوژن و بیـانگرن و ئابلووقـەیان بـدەن و لـە کەمیندا بۆیان دابنیشـن، بەڵام ئەگەر گەڕانەوە بـۆ لای خـواو نوێـژیان بەرپاکـردو زەکاتیانـدا، ئەوە ڕێیـان بەربدەن، بێگومان خوا لـێبووردەی بە بەزەیی یە.

کەواتـە: ئایـەتی شمـشێر فـەرمان ناکـات کـە لەگـەڵ هـەموو موشـریکەکـان و هەموو کافران دا جەنگ بکرێ، بەڵکو تـەنیا، لەگـەڵ ئـەو کافرانـەدا کـە پـەیمانیان لەگـەڵ مـسوڵمانانـدا هەیـەو، پەیمانەکـەیان شـکاندوەو خیانـەتیان کـردوە، ئـەویش دوای ئـەوەی کـە چـوار مـانگ مۆڵەتیـان دەدرێتـێ، بۆئـەوەی ئەهلـی کوفـر مـسوڵمانان تۆمـەتبار نەکـەن بـەوە کـە خـاوەن پـەیمان نـین، وەك لـە سـووڕەتی (الأنفـال)یشدا خـوا ﷻ دەفـەرموێ: ﴿ وَإِمَّا تَخَافَنَّ مِن قَوْمٍ خِيَانَةً فَٱنۢبِذْ إِلَيْهِمْ عَلَىٰ سَوَآءٍ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْخَآئِنِينَ ۝٥٨ ﴾، واتە: ئەگەر مەترسییت هەبوو لە کۆمەڵێك کـە پـەیمانت لەگەڵیانـدا هەیـە، (کـە پـەیمان بـشکێنن و غـەدرو خیانـەتت لـێبکـەن) پەیمانەکەیان وێبدەوەو ئاگاداریان بکەوە (کە ئێمە پەیمانمان لـە نێوانـدا نـەماوە) بێگومان خوا ﷻ خائینـان و پەیمـان شـکێنانی خۆشـناوێن.

کەواتە: ئەوە کە ناویشیان لەو ئایەتە ناوە (ئایەتی شمشێر) ئەویش وانیە، چونکە ڕاست نیە کە فەرمانی کردبێ شەڕ لەگەڵ هەموو کافراندا بکرێ بە موتڵەقیی، بەڵکو تەنیا ئەو کافرانەی کە پەیمانیان لەگەڵ مسوڵمانان هەیەو پەیمان دەشکێنن، جەنگ لەگەڵ کردنیان ڕەوایە، ئەمما ئەوەی کە پابەندە بە پەیمانەوە، دروست نیە شەڕی لەگەڵدا بکرێ، بە دەقی ئەو ئایەتانەی کە هەر لە هەمان سوورەتدا هاتوون .

ئەوە کورتەیەك دەربارەی (نَسْخ) کە ئومێدم وایە بەرچاوی هەموو لایەك ڕۆشن بووبێتەوە، وە خوا یارمەتیمان بدات بەو شێوەیە کە شایستەیەو پێویستە لە قورئان تێبگەین‌و، هیچ دوو دڵییەکمان بۆ دروست نەبێ لە بەرانبەر هیچ ئایەتێکدا، کە نەسخ کراوەتەوەو لابراوە، هەتا یەقینیمان لەوبارەوە بۆ پەیدانەبێ، کە بە تەئکید هیچ کاتێکیش ئینسان ناگاتە یەقین کە هیچ کام لە ئایەتەکانی قورئان، کە ئێستا هەن (نَسْخ) کراونەتەوەو، بەبێ یەقینیش، شتێك کە یەقینت لەبارەیەوە هەبووە لاناچێ، زانایانی (أصول الفقه) دەڵێن: (لايَزُولُ اليَقِين إلاّ باليَقِين)، شتێك کە یەقینت دەربارەی هەیە دەبێ یەقینێکی پێچەوانەی پەیدابکەی ئنجا لادەچێ، بۆ نموونە: کە یەقینت بوو دەستنوێژت هەیە، دەبێ یەقینیش پەیدابکەی کە دەستنوێژت شکاوە، ئەگەرنا بەدوو دڵیی لاناچێ، ئێمە یەقینمان هەیە ئەم کتێبە فەرمایشتی خوایە، وە هەمووی موحکەمەوەو کاری پێ دەکرێ، بۆیە دەبێ یەقین پەیدابکەین کە فڵانە ئایەت کاری پێناکرێ‌و (نَسْخ) بۆتەوەو هەرگیزیش ئەو یەقینە پەیدانەبووەو پەیداش نابێ[1]، بۆیە دەبێ خۆمان لەو جۆرە بۆچوونە بپارێزین‌و بێگومان لەگەڵ مەقامی بەرزی کتێبی خواشدا ناگونجێ، بەبێ

---

١) چونکە سەرجەم ئەو دەقانەی کە بەناوی سوننەتەوە گێڕاونەوەو باسی نەسخ کرانەوەی هەندێك ئایەت دەکەن، بە زاراوی زانایان فەرمووودەناس، جۆری (أحاد)ن‌و هیچیان جۆری (متواتر) نین، دیارە قورئانیش کە هەمووی بە شێوەیەکی (متواتر)و یەقینیی بە ئێمە گەیشتوە، بە دەقێکی (احاد)و گومانبەخش (ظَنّي)، نەسخ نابێتەوە.

بەڵگـــەی دڵنیاكـــەر بڵـــێین: فـــلان ئایـــەت نەســـخ كراوەتـــەوە ! وە خـــوا لـــەو توێژەرەوانـــەی قورئـــانیش خۆشـبێ كـە دیـارە (إجتهـاد)یـان كـردوەو، پێیـان وابـووە، هەنـــدێ لـــە ئایەتەكـــان (مَنـــسوخ)ن، ئەویـــش وەك گوتمـــان زیـــاتر بەهـــۆی بەكارهێنـــانی بەهەڵـــەی ئـەو تەعبیـــرەی زانایـــانی پێـشینەوە بـووە، كـــە ئـــەوان وشـــەی (نَسْخ)یـان بـــە چەمـــك‌و واتایەكـــی فراوانتـــر بەكارهێنـــاوە، لـــەوەی دواتـــر بۆتـە بـاو، وەك ڕوونمـان كردەوە.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی بیست و سێ یەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان لە ئایەتی (١١١ تاكو ١١٥) لە سوورەتی (البقرة) دەگرێتە خۆی، واتە: پێنج (٥) ئایەت، ئەم پێنج ئایەتە سەرەتا باسی خۆپەرستیی جوولەكەو نەصرانیی یەكان دەكەن، كە دەڵێن بەهەشت تەنیا بۆ ئێمەیەو غەیری جوولەكەو نەصرانیی ناچنە بەهەشتێ، خوای پەروەردگاریش بەدرۆیان دەخاتەوە، وە دوایی باسی ئەوە دەكەن كە هەركام لە جوولەكەو نەصرانیی یەكان یەكتر تۆمەتبار دەكەن كە لەسەر هەق نین، وە دوایی خوا ﷻ باسی ئەوە دەكات، كە چ زوڵمێكی گەورەیە كە ماڵەكانی خوا قەدەغە بكرێن لەوەی ناوی خوایان تێدا بهێنرێ، یاخود لەوە كە ئاوەدان بكرێنەوە بە طاعەتی خوا ﷻ، پاشان باسی ئەوەمان بۆ دەكات كە لە هەرشوێنێك ڕووبكەنە خوا، ئەوە ڕووی خوای پەروەردگار لەوێیەو ڕەزامەندیی خوا لەوێیە، ئەمە نێوەڕۆكی مانای ئەم ئایەتانەیە.

﴿وَقَالُوا۟ لَن يَدْخُلَ ٱلْجَنَّةَ إِلَّا مَن كَانَ هُودًا أَوْ نَصَـٰرَىٰ ۗ تِلْكَ أَمَانِيُّهُمْ ۗ قُلْ هَاتُوا۟ بُرْهَـٰنَكُمْ إِن كُنتُمْ صَـٰدِقِينَ ﴿١١١﴾ بَلَىٰ مَنْ أَسْلَمَ وَجْهَهُۥ لِلَّهِ وَهُوَ مُحْسِنٌ فَلَهُۥٓ أَجْرُهُۥ عِندَ رَبِّهِۦ وَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿١١٢﴾ وَقَالَتِ ٱلْيَهُودُ لَيْسَتِ ٱلنَّصَـٰرَىٰ عَلَىٰ شَىْءٍ وَقَالَتِ ٱلنَّصَـٰرَىٰ لَيْسَتِ ٱلْيَهُودُ عَلَىٰ شَىْءٍ وَهُمْ يَتْلُونَ ٱلْكِتَـٰبَ ۗ كَذَٰلِكَ قَالَ ٱلَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ مِثْلَ قَوْلِهِمْ ۚ فَٱللَّهُ يَحْكُمُ بَيْنَهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ فِيمَا كَانُوا۟ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ ﴿١١٣﴾ وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّن مَّنَعَ مَسَـٰجِدَ ٱللَّهِ أَن يُذْكَرَ فِيهَا ٱسْمُهُۥ وَسَعَىٰ فِى خَرَابِهَآ ۚ أُو۟لَـٰٓئِكَ مَا كَانَ لَهُمْ أَن يَدْخُلُوهَآ إِلَّا خَآئِفِينَ ۚ لَهُمْ فِى ٱلدُّنْيَا خِزْىٌ وَلَهُمْ فِى ٱلْـَٔاخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿١١٤﴾ وَلِلَّهِ ٱلْمَشْرِقُ وَٱلْمَغْرِبُ ۚ فَأَيْنَمَا تُوَلُّوا۟ فَثَمَّ وَجْهُ ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ ﴿١١٥﴾﴾.

## مانـای وشـە بە وشـەی ئایەتەکـان

((وە گوتیـان جگـە لـە جوولەکـەو نەصرانیی یـەکان کـەس ناچێتە بەهەشتێ، ئەوانەن خەیاڵ پڵاوەکانیان، بڵـێ: ئەگـەر ڕاسـت دەکـەن بەڵگەتان بێنن ! ﴿١١١﴾ بـا، هەرکەسـێ ڕووی خـۆی بـە خـوا بـسپێرێو چـاکەکاریش بـێ، ئـەوە پاداشـتی لای پەروەردگاریەتی، وە نەترسیان لەسەرەو نەپەژارە دایانـدەگری ﴿١١٢﴾ وە جوولەکەکان گوتیان: نەصرانیی یەکان لەسـەر هیچ نین، وە نەصرانیی یەکان گوتیـان: جوولەکـە لەسـەر هیـچ نـین لـە حاڵـێکدا کـە کتێبـیش دەخوێننـەوە ! ئەوانـەی ناشـزانن هـەر قسەی وەك هـی وانیـان دەکـرد، جـا خـوا لـە ڕۆژی قیامەتـدا دادوەرییـان لەنێوانـدا دەکات لەوەدا کە تێیدا کەوتوونە ڕا جیاییەوە ﴿١١٣﴾ وە ئایا کێ سـتەمکارترە لـەوەی کـە ناهێڵـێ نـاوی خـوا لـە مزگەوتـەکانی خـوادا بهێنـرێو بـۆ وێرانکردنیـان تێدەکۆشێ، ئا ئەوانە مەگەر بەترس و لەرز، ئەگەرنا بۆیـان نیـە بچنە نێویـان، لـە دنیـادا زەبـوونییو لـە دوارۆژدا ئـازارێکی گـەورەیان بـۆ هەیـە ﴿١١٤﴾ وە ڕۆژهـەڵاتو ڕۆژئـاوا هی خوانو، ڕووتـان لـە هەرجێیـەك بـێ ڕووی خـوا لەوێیـە، بێگومـان خـوا فراوانی زانـایە ﴿١١٥﴾)).

## شـیکردنـەوەی هەندێـك لە وشـەکان

(**ٱلْيَهُودُ**): (الهَـوْدُ: الرُّجُوعُ بِرِفْقٍ) واتـە: گەڕانـەوە بەنـەرمیی، لـە قورئانـدا هاتوە: ﴿... إِنَّا هُدْنَآ إِلَيْكَ ...﴿١٥٦﴾﴾ الأعـراف، (يَعـني إِنَّـا رَجَعْـنَا إِلَيـكَ) واتـە: ئێمـە گەڕاینەوە بـۆلای تـۆ، (هُـودٌ) کـۆی (هـائِد)ە، واتـە: (تائِـبٌ)، (رَاجِـع). کەواتـە: نـاوی (يَهـودي) ناوێکـی بـەرزە، بـەڵام بەداخـەوە نێوەڕۆکەکـەی بـە زۆریـی بێـزراوە (مَذمُومَ)ە، دیارە ئەوانەی کە لەسـەر یەهوودییەت دەمێننەوە، لەگـەڵ ئەوانەی کە ئیمان دێـنن لەیـەك جیـان، جـا دەگـوترێ: (هَادَ فُلاَنٌ: إذا تَحَرَّى طَرِيقَةَ اليهـود فـي الـدِّينِ)، واتە: ئەگەر کـردو کۆشـی کـرد، بـۆ ئـەوە کـە وەك

جوولەکەکان دینداریی بکات.

(ٱلنَّصَـٰرَىٰ): (إمّا مِن النَّصْرْ أو مِن النَّصرَانة، قَرِيَة، مُفْرَدُهُ النَّصراني والجَمعُ: نَصَارَى) (نصارى) یان لە (نَصْر)ەوە هاتوە، کە عیسا فەرمووی: ﴿...مَنْ أَنصَارِىٓ إِلَى ٱللَّهِ...﴾ (٥٢) آل عمران، واتە: کێ هاوکارو پشتیوانمە بۆلای خوا، هەندێکیش دەڵێن: لە (نصرانة)ەوە هاتوە، کە ناوی دێیەك یاخود ناوی شارێکە لە فەلەستین، دیارە وشەی: (نصراني)، واتە: ئەو کەسەی خەڵکی (نصرانة)یەو عیساش ﷺ خەڵکی ئەو شوێنە بووە، کە ئێستا (ناصرة)ی پێدەڵێن‌و کاتی خۆی (نصرانة) بووەو گوتوویانە: (نصراني) واتە: ئەوانەی کە بەدوای عیسا دەکەون، کە خەڵکی ئەو شوێنەیە.

(أَمَانِيُّهُمْ): (أمَاني) کۆی (أُمنِيَّة) واتە: خۆزگەو بریاو ئاوات خواستن.

(بُرْهَـٰنَكُمْ): (مِنَ البَرهة بِمَعْنَى القَطْعِ وَهُوَ مَصدَرُ: بَرِهَ، يَبْرَهُ: إذَا ابيَضَّ) دەگوترێ: (بَرِهَ، يَبْرَهُ) شتێك کە سپی بوو، عەرەب دەڵێن: (بَرِهَ)، واتە: سپی بوو، (برهان)یش بریتیە لە بەڵگەیەك کە زۆر ڕۆشن‌و ئاشکرابێ، هێندێکیش دەڵێن: لە (البُرهَة)ەوە هاتوە، (البُرهَة: مدة مِنَ الزَّمان)، واتە: ماوەیەکی کەم لە کات، (برهان)یش بۆیە لەوەوە هاتوە، چونکە قسەی تەرەفی بەرانبەر (قطع) دەکاو دەیبڕێ.

(أَسْلَمَ): یان بەمانای (استسلم) ملکەچ بوو، یان بەمانای (أخلَصَ) خۆی بۆ ساغ کردەوە، دێ، یانی: بەشی غەیری خوای بەخۆیەوە نەهێشت.

(مُحْسِنٌ): (الحُسْنُ كُلُّ مُبْهِجٍ مَرغُوب فِيهِ و الإحسَان: زِيادَة مِنَ العَدْل فَتَحرِّي العَدْل وَاجِب وتَحرِّي الإحسَان نَدْب و تَطَوّع)، واتە: (حُسْن) هەموو شتێکی دڵخۆشکەرو دڵپەسەندەو (إحسان)یش زیادەیە لە دادگەریی بۆیە کۆشش کردن بۆ دادگەریی فەرزەو، خەفتان لە چاکەکاریی (إحسان) پەسندە، (محسن)یش واتە: چاکەکار.

(**وَجْهَهُۥ لِلَّهِ**): (أصْلُ الوَجْهِ: الجَارِحَة، الذَّات) (وَجه) واتە: ڕوو، دەم وچاو، بەڵام کە بۆ خـوا ﷻ بەکـاربێ، بەتەئکیـد مەبەسـتی پێـی ئەنـدام نیـە، جـا هەندێك لە زانایان دەڵێن: (وَجه) سیفەتێکی خوایەو ئێمە نازانین چۆنە، وەك هەموو سیفەتەکانی دیکە کە نازانین چۆنن؟ هێندێکیش دەڵێن: (وَجه) بەپێی سیاق دەبێ تەماشای بکەین لێرەدا بە پێی ﴿فَأَيْنَمَا تُوَلُّوا۟ فَثَمَّ وَجْهُ ٱللَّهِ﴾، هەندێك لە زانایان دەڵێن: ڕوو لە هەر شوێنێ بکەی ڕەزامەندیی خوا لەوێیە وە هەنـدێك دەڵێن: بە مانـای (جِهَةُ الله)یـە، واتـە: ئـەو لایـەی کـە خـوا بـۆی پەسند کردوون، ئەگەر قیبلەتان نەزانی ڕوو لە هەر شوێنێك بکەن ئەوا خوا لێتـان قـەبوول دەکـات، وە هەنـدێ دەڵـێن: (وَجـه) لـە هەنـدێك شـوێنان بــەمانای (ذات) دێــت، وەك ﴿كُلُّ مَنْ عَلَيْهَا فَانٍ ﴿٢٦﴾ وَيَبْقَىٰ وَجْهُ رَبِّكَ ذُو ٱلْجَلَـٰلِ وَٱلْإِكْرَامِ ﴿٢٧﴾﴾ الرحمن، لێرەدا دەڵێن: (وَجه) بەمانای (ذات) دێت، هەنـدێکیش وەك گوتـم هەر بەمانای (ڕوو) تەفسیری دەکەن، بەڵام نەك بـەمانای ئـەوە کـە ئێمە لێی حـاڵی دەبین، چونکە هیچ کـام لە سیفەتەکانی خوا، نابـێ بـە هـیچ شێوەیەك تەصـەووڕی ئـەو مەفهوومـە بکـەی کـە دێتـە زەینـی تـۆوە، کـە بـۆ دروستکراوەکان (مَخلُوقات) بەکاردێ، کە دەڵـێین: (عَـيْن) وە دەڵـێین: (يَـد) وە دەڵێین: (وَجـه) یـان دەڵێین: خـوا لەسـەر عەرشـە، وە کـە دەڵێین: بینینـی خـوا، بیسـتنی خـوا، دەسـتەڵاتی خـوا، زانیـاری خـوا، ئـەوە هیـچی وەك هـی دروستکراوەکـان نیـە، بەڵـکو سیفەتەکـانی خـواش وەك ذاتـی خـوا وان: ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِۦ شَىْءٌ ۖ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْبَصِيرُ ﴿١١﴾﴾ الشورى، واتـە: هـیچ شـتێك وەك خوا نیـە، وە ئەو بیسـەری بینـەرە.

## هــۆی هاتنە خــوارەوەی ئایەتەکــان

١/ هــۆی هاتنــە خــوارەوەی ئــەم ئایەتــەی کــە دەفــەرموێ: ﴿ وَقَالَتِ ٱلْيَهُودُ لَيْسَتِ ٱلنَّصَٰرَىٰ عَلَىٰ شَىْءٍ وَقَالَتِ ٱلنَّصَٰرَىٰ لَيْسَتِ ٱلْيَهُودُ عَلَىٰ شَىْءٍ وَهُمْ يَتْلُونَ ٱلْكِتَٰبَ كَذَٰلِكَ قَالَ ٱلَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ مِثْلَ قَوْلِهِمْ فَٱللَّهُ يَحْكُمُ بَيْنَهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ فِيمَا كَانُوا۟ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ ﴿١١٣﴾ ﴾، {(عَنْ ابنِ عَبَّاسٍ ولَمَّا قَدِمَ أَهْلُ نَجْرَانَ مِنْ النَّصَارَى عَلَى رَسولِ اللهِ ﷺ أَتَتْهُمْ أَحْبَارُ يَهُودَ، فَتَنَاظَروا، فَتَنَازَعُوا عِنْدَ رَسولِ اللهِ ﷺ فَقَالَ: رَافِعُ بْنُ حُرَيْمِلَةَ: مَا أَنْتُمْ عَلَى شَيءٍ وكَفَرَ بِعِيسَى وبالإنجِيلِ، فَقَالَ رَجُلٌ مِنْ أَهْلِ نَجْرَان مِنْ النَّصَارَى لِليَّهُود: مَا أَنْتُمْ عَلَى شَيءٍ وجَحَدَ نُبُوَّةَ مُوسَى وَكَفَرَ بالتَّورَاةِ، فأَنْزَلَ اللهُ تَعَالى هَذهِ الآيَة) (أسباب النزول للنيسابوري، ص: (٢٤)، وصفوة التفاسير ج (١)، ص: (٧٢) وفتح القدير ج (١)، ص: (١٧٧)}، واتــە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس خوای لێ ڕازی بێ دەڵێ: کاتێك وەفدی نەجران کە نەصرانیی بوون هاتنە لای پێغەمبەر ﷺ، زانایانی جوولەکەش هاتنە لای پێغەمبەر ﷺ لەو کۆڕو مەجلیسەدا بەشدار بوون، وە لەخزمەت پێغەمبەردا بوو بە مشتومڕیان، (رافع بن حريملة) کە زانای جوولەکەکان بوو لە مەدینە بە نەصرانیی یەکانی گوت: ئێوە لەسەر هیچ نین، وە کوفریشی بە عیساو بە ئینجیل کردو گوتی: هیچیان ڕاست نین، پیاوێکیش لە نەصرانیی یەکان کە نەصرانیی بوو، ئەویش بە جوولەکەکانی گوت: ئێوە لەسەر هیچ نین، وە ئەویش بێبڕوایی پیشاندا بە پێغەمبەرایەتی مووساو کوفریشی بە تەورات کرد، ئیدی خوای بەرز بەو هۆیەوە ئەم ئایەتەی نارده خوارێ.

٢/ هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتەی کە دەفەرموێ: ﴿ وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّن مَّنَعَ مَسَٰجِدَ ٱللَّهِ أَن يُذْكَرَ فِيهَا ٱسْمُهُۥ وَسَعَىٰ فِى خَرَابِهَآ ...﴿١١٤﴾ ﴾، لەوبارەوە دوو گێڕانەوە (رواية) هەن:

أ) {(عَنْ ابنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُما نَزَلَتْ فِي الرُّومِ والنَّصَارَى غَزَوا بَيتَ المَقدِسِ فَخَرَّبُوا المَسجِدَ وأحرَقُوا التَّورَاة) (أسباب النزول للنيسابوري، ص: (٢٤)}، دەڵێ: دەربارەی ڕۆم و نەصرانییەکان هاتە خوار کە (بيت المقدس) یان کاول کردو مزگەوتەکەیان ڕووخاند (لەبەر ئەوەی مزگەوتەکە بە دەست جوولەکەکانەوە بوو) وە تەوڕاتیشیان سووتاند.

ب) {(وقَالَ ابنُ عَبَّاسٍ فِي رِوَايَةِ عَطَاءَ: نَزَلَتْ فِي مُشرِكِي أهْلِ مَكَّةَ ومَنعِهِم المُسلِمِينَ مِن ذِكرِ اللهِ تَعَالَى فِي المَسْجِدِ الحَرام) (أسباب النزول للنيسابوري، ص: (٢٤)}، (عَطَاء) لە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسی گێڕاوەتەوە کە ئەم ئایەتە مەبەست پێی هاوبەش دانەرەکانە، کە لە مەککە مسوڵمانیان قەدەغە کرد لەوەی کە بچنە مزگەوتی حەرامەوەو، یادی خوای بەرزی تێدابکەن.

٣/ هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتەی کە دەفەرموێ: ﴿وَلِلَّهِ ٱلْمَشْرِقُ وَٱلْمَغْرِبُ فَأَيْنَمَا تُوَلُّوا۟ فَثَمَّ وَجْهُ ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ ﴿١١٥﴾﴾، لەوبارەوەش چەند گێڕانەوەیەك (رواية) هەن:

أ) {(عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبدِالله، قَالَ: بَعَثَ رَسُولُ اللهِ ﷺ سَرِيَّة كُنْتُ فِيهَا، فأصَابَتْنا ظُلمة فَلَمْ يُعْرَفِ القِبلَةُ، فَقَالَتْ طَائِفَةٌ مِنّا: قَدْ عَرفنا القِبْلَة، هي هاهُنا قِبَلَ الشِّمَال، فَصَلُّوا، وَخَطُّوا خطوطاً، فَلَمَّا أصبَحوا وَطَلَعَتِ الشَّمس، أصبَحَت تِلكَ الخطوط لِغَيرِ القِبلَة، فلَمَّا قَفَلْنَا مِن سَفَرِنَا سألنا النَّبيّ ﷺ، عَن ذَلِكَ فَسَكَتَ، فَأَنْزَلَ اللهُ تَعَالَى هَذِهِ الآيَةَ: ﴿وَلِلَّهِ ٱلْمَشْرِقُ وَٱلْمَغْرِبُ فَأَيْنَمَا تُوَلُّوا۟ فَثَمَّ وَجْهُ ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ ﴿١١٥﴾﴾)}

(رَوَاهُ الدَّارَقُطنِي بِرقم: (١٠٥٠)، والواحدي في (أسباب نزول القرآن)، وإسناده ضعيف)، واتە: جابری کوڕی عەبدوڵڵا دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ سریەیەکی نارد کە منیشی تێدا بووم، تاریکییمان لێ داهات و نەمانزانی قیبلە لە کوێیە، کۆمەڵێکمان دوایی گوتیان: ئێمە دەزانین قیبلە لە کوێیە،

گوتیان: قیبلە بەرەو ئێرەیە، دەستیان بۆ لای باکوور ڕاداشت، ئیدی نوێژمان کرد، وە خەتێکیشمان کێشا بۆ ئەوەی دوایی بزانین داخۆ ئایا ئەوە کە گوتوویانە قیبلەیە ڕاست دەرچووە یان نا ؟ جا کاتێک کە ڕۆژ بۆوە (دیارە کە شەو بووە)و خۆرهەڵات، تەماشامان کرد ئەو هێڵەی کێشابوومان بەرەو قیبلە هەڵە بووە، کە گەڕاینەوە لە پێغەمبەرمان ﷺ پرسی لەوبارەوە کە (ئەو نوێژەمان کردوە بەرەو قیبلە نەبووە) پێغەمبەری خوا ﷺ بێدەنگ بوو، تا ئەم ئایەتە هاتە خوارێ کە دەفەرموێ: ﴿ وَلِلَّهِ ٱلْمَشْرِقُ وَٱلْمَغْرِبُ ۚ فَأَيْنَمَا تُوَلُّوا۟ فَثَمَّ وَجْهُ ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ ﴾، ڕۆژهەڵاتو ڕۆژئاوا هی خوان ڕوو لە هەر شوێنێك بکەن، ڕووی خوا لەوێیە، یان ڕەزامەندیی خوا لەوێیە، یاخود ئەو قیبلەیەی کە خوا لێتان قەبووڵ دەکات، لە کاتێکدا کە بە قیبلە نازانن، ئەوە بۆتان حیسابە ڕوو بەهەر لایەك نوێژ بکەن.

**ب)** هەندێکیش گێڕاویانەتەوە لە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسەوەوە: وەك لە کتێبی: {أسباب النزول، للنيسابوري، ص (٢٥، ٢٦)}دا هاتوە، کە کاتێك پێغەمبەر ﷺ نوێژی کرد لەسەر نەجاشی هەندێکیان گوتیان: جا چۆن نوێژ لەسەر کەسێك دەکەی کە قیبلەکەی وەك قیبلەی ئێمە نەبووە ! خوای پەروەردگار ئەمەی ناردە خوارێ کە ڕوو لە هەر شوێنێك بکەن خوا هەر حیسابی دەکات، هەر کەسە بەپێی ئەو دینەی خۆی کە کاتی خۆی لەسەری بووە، دیارە نەجاشی لەوانەیە ئەو کاتە گۆڕینی قیبلەی پێنەگەیبێ، یاخود نەیتوانیوە لەبەر قەومەکەی ڕوو لە قیبلەی مسوڵمانان بکات، هەرچەندە لەدڵدا مسوڵمان بووە، وەك زۆر واجباتی دیکەش، کە نەیتوانیوە جێبەجێیان بکات، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەر بە ئیماندارو مسوڵمان لەقەڵەم دراوە، چونکە هەر ئەوەندەی لە توانادا هەبووە.

**ج)** هەروەها هەر لەوبارەوە ئەم گێڕانەوەیەش هەیە: {(عَنْ ابْنُ عُمَرَ رضي الله عنه قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ يُصَلِّي ﷺ عَلَى رَاحِلَتِهِ تَطَوُّعًا أَيْنَمَا تَوَجَّهَتْ بِهِ، ثُمَّ قَرَأَ ابْنُ عُمَرَ هَذِهِ الآيَةَ) (رَوَاهُ التِّرمِذِيُّ برقم: (٢٩٥٨)، وَصَحَّحَهُ الألباني

في (صفة الصلاة)}، عەبدوڵڵای كوڕی عومەر خوا لێیان ڕازی بێ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ نوێژی سوننەتی لەسەر وڵاخ دەكرد، ڕووی لەهەر لایەك كردبایە، وە لەوبارەوە ئەو ئایەتە هاتە خوارێ. {واتە: ئەوە بۆ نوێژی سوننەتەو كاتێك ئینسان سواری وڵاخ دەبێت بۆ نوێژی سوننەت، ڕووی لە هەر كوێیەك بێ، قەیناكە، بەڵام نوێژی فەرز دەبێ بەرەو قیبلەبێ}.

## مانای گشتی ئایەتەكان

شایانی باسە كە لێرەدا یەكەم جارە لە سووڕەتی بەقەرەدا وشەی نەصرانیی یەكان (نصارى) بێت، دیارە پێشتر بەناوی ئەهلی كیتاب باسكراون، وە كە دەگوترێ: (خاوەن كتێبەكان) دیارە جوولەكەو نەصرانیی‌یەكان بە پلەی یەكەم دەگرێتەوە، بەڵام وشەی نەصرانیی یەكەم جارە دێ، جا خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَقَالُواْ لَن يَدْخُلَ ٱلْجَنَّةَ إِلَّا مَن كَانَ هُودًا أَوْ نَصَٰرَىٰ ﴾، وە جوولەكەو نەصرانیی‌یەكان گوتیان: جگە لەوانەی جوولەكەن یان نەصرانیی، هیچ كەسی دیكە ناچێتە بەهەشت، واتە: جوولەكە گوتیان: بەس جوولەكە دەچن‌و نەصرانیی یەكانیش گوتیان: بەس نەصرانیی دەچن، نەك بلێی هەردووكیان ڕێككەوتبن گوتبیان جوولەكەو نەصرانیی دەچن، بە بەڵگەی ئایەتی دوایی كە دێ، كە جوولەكە دەڵێن: نەصرانیی لەسەر هیچ نین، وە نەصرانیی دەڵێن: جوولەكە لەسەر هیچ نین، مانای وایە جوولەكە گوتوویانە: بەس جوولەكە دەچنە بەهەشتێ‌و (نەصرانیی)ش گوتوویانە: بەس نەصرانیی دەچنە بەهەشتێ، خواش دەفەرموێ: ﴿ تِلْكَ أَمَانِيُّهُمْ ﴾ ئەوە خۆزگەو ئاوات‌و خەیاڵپڵاوی ئەوانە ﴿ قُلْ هَاتُواْ بُرْهَٰنَكُمْ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴾، بڵێ: بەڵگەتان بێنن، ئەگەر ڕاست دەكەن، جیاوازی نێوان ڕاست‌و درۆ بەڵگەیە، جا ئەگەر بەڵگەتان هەیە بیهێنن، وە ئەگەر نەتانهێنا مانای وایە درۆیە، دوایی خوا ﷻ بەدرۆیان دەخاتەوەو دەفەرموێ: ﴿ بَلَىٰ ﴾ با، خەڵكی دیكە دەچنە بەهەشت، جا ئایا كێ دەچێتە بەهەشت؟ ﴿ مَنْ أَسْلَمَ وَجْهَهُۥ لِلَّهِ وَهُوَ مُحْسِنٌ ﴾، نەك جوولەكەو نەصرانیی،

هەرکەسێك خۆی بۆ ساغ کردبێتەوەو گەردنکەچیی خۆی بۆ خوا یەکلاکردبێتەوەو، لەگەڵ بەندەکانی خوادا چاکەکار بێت ﴿ فَلَهُۥٓ أَجۡرُهُۥ عِندَ رَبِّهِۦ ﴾، ئەوە پاداشتی خۆی لەلای خوای خۆی هەیە، ﴿ وَلَا خَوۡفٌ عَلَيۡهِمۡ وَلَا هُمۡ يَحۡزَنُونَ ﴾، وە ئەو جۆرە کەسانە نە ترسیان هەیە لە داهاتووو نە خەمو پەژارەشیان هەیە بۆ ڕابردوو، ئنجا باسی قسەیەکی دیکەیان دەکاتو دەفەرموێ: ﴿ وَقَالَتِ ٱلۡيَهُودُ لَيۡسَتِ ٱلنَّصَٰرَىٰ عَلَىٰ شَيۡءٖ وَقَالَتِ ٱلنَّصَٰرَىٰ لَيۡسَتِ ٱلۡيَهُودُ عَلَىٰ شَيۡءٖ ﴾، وە جوولەکەکان گوتیان: نەصرانیی یەکان لەسەر هیچ نین، (لەسەر بەتاڵن) نەصرانیی یەکانیش گوتیان: جوولەکەکان لەسەر هیچ نین (لەسەر بەتاڵن) کە لەڕاستیدا هەردووکیشیان ڕاست دەکەن دەربارەی یەکتر ڕاست دەکەن، بەڵام دەربارەی خۆیان کە هەرکامێکیان پێیان وابووە لەسەر هەقن، درۆ دەکەن، ئەگەرنا دەربارەی یەکتر ڕاست دەکەن. بەڵام خوا بۆچی ڕەخنەیان لێدەگرێ ؟ دەفەرموێ: ﴿ وَهُمۡ يَتۡلُونَ ٱلۡكِتَٰبَ ﴾، لە حاڵێکدا کە ئەوان کتێبیش دەخوێننەوە. یانی: باشە مادام کتێبی خواتان لەبەردەستدایەو ئەی نەصرانیی ! تۆ دەزانی کە جوولەکە لەسەر هەق نیەو ئەی جوولەکە ! تۆش دەزانی کە نەصرانیی لەسەر هەق نیەو کتێبیشتان لەبەردەست دایەو نیشانەکانی پێغەمبەری کۆتایی تێدان، کەواتە: ئەگەر بێی قسەی هەردووکیان کۆبکەیەوە، مانای وایە کۆیەکە ئەوەیە کە هەردووکیان لەسەر ناهەقن ! کەواتە وەرنە سەر ڕێی هەق مادام کتێبتان لەبەردەستدایە، ﴿ كَذَٰلِكَ قَالَ ٱلَّذِينَ لَا يَعۡلَمُونَ مِثۡلَ قَوۡلِهِمۡ ﴾، ئەوانەش کە نازانن {کە مەبەست پێی ئەو کافرانەن کە کتێبی ئاسمانییان لەبەردەستدا نەبووە} ئەوانیش هەروەك وانو دەیانگوتە مسوڵمانان: ئێوە لەسەر هیچ نین، یانی: لەسەر هەق نین ﴿ فَٱللَّهُ يَحۡكُمُ بَيۡنَهُمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ فِيمَا كَانُواْ فِيهِ يَخۡتَلِفُونَ ﴾، خوا لە ڕۆژی هەڵسانەوە (القیامة)دا دادوەرییان لەنێواندا دەکات، دەربارەی ئەو شتانەی تێیدا دەکەوتنە کێشەو مشتومڕەوە، ئنجا دێتە سەر باسی مەسەلەیەکی دی کە پەیوەندیی هەیە بە جوولەکەکانو نەصرانیی یەکانو بە موشریکەکانیشەوە، دەفەرموێ: ﴿ وَمَنۡ أَظۡلَمُ مِمَّن مَّنَعَ مَسَٰجِدَ ٱللَّهِ أَن يُذۡكَرَ فِيهَا ٱسۡمُهُۥ وَسَعَىٰ فِي خَرَابِهَآ ﴾،

واته: کێ ستەمکارترە لە کەسێك کە مزگەوتەکانی خوا قەدەغە دەکات لەوە ناوی خوایان تێدا بهێنرێ، وە تێدەکۆشێ بۆ ئەوەی کاولیان بکات، کێ لەو کەسانە ستەمکارترو خراپترە ؟ بێگومان هیچکەس، ﴿أُوْلَٰٓئِكَ مَا كَانَ لَهُمْ أَن يَدْخُلُوهَآ إِلَّا خَآئِفِينَ﴾، ئا ئەوانە بۆیان نیە بچنە ئەو مزگەوتانەوە بە حوکمی شەرع، مەگەر بە ترس‌و لەرز، یاخود شایستەی ئەوە نین بچنە نێو ئەو مزگەوتانەوە مەگەر بە ترس‌و لەرز، ﴿لَهُمْ فِي ٱلدُّنْيَا خِزْيٌ وَلَهُمْ فِي ٱلْأَٰخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٌ﴾، لە دنیادا زەبوونیی‌و سەرشۆڕییان بۆ هەیە، وە لە دوارۆژدا ئازارێکی مەزن‌و گەورەیان بۆ هەیە، هەڵبەتە ئەوە موژدەیەکی زۆر خۆشی تێدایە بۆ مسوڵمانان، چونکە خوا هەواڵمان پێ دەدا کە هەموو ئەوانەی دژی ماڵەکانی خواو مزگەوتەکانی خوان، سەرەنجام لە دنیادا تووشی زەبوونیی‌و سەرشۆڕیی دەبن، وە لە دوارۆژدا ئازارێکی گەورە چاوەڕێیان دەکات، هەموو ئەوانەی دژی ماڵەکانی خوان کە ناوی خوایان تێدا بەرزبکرێتەوەو، ڕێگریی دەکەن لەو ئەرکە شەرعییانەی کە بۆ ماڵەکانی خوا دیاریکراون، تێیاندا ئەنجام بدرێن، وە هەوڵدەدەن کە ماڵەکانی خوا کاول بکەن، دیارە کاولکردن‌و وێرانکردنی ماڵەکانی خواش، دوو جۆری هەیە:

یەکەم/ وێرانکردنی ماددیی: وەك ئەوەی کە ڕژێمی بەعس شۆفەڵی لە مزگەوتەکان دەدا.

دووەم/ وێرانکردنی مەعنەویی: ئەویش ئەوەیە کە نەهێڵرێ مزگەوت ئەرکی شەرعیی خۆی تێدا ئەنجام بدرێ‌و، دەرس‌و دەوری تێدا بخوێنرێ‌و، هەق لەسەر مینبەرەکەی بگوترێ‌و، مسوڵمانانی تێدا بەرچاو ڕۆشن بکرێتەوەو، پەروەردە بکرێن‌و، ڕاستییەکانی ئیسلامی تێدا بخرێنەڕوو، بە هەر بڕوبیانوویەکەوە بێ.

ئەمە وێرانکردنی مەعنەوییەو لەڕاستیدا وێرانکردنی مەعنەوییش هیچی کەمتر نیە لە وێرانکردنی ماددیی، چونکە خوا ﷻ چوار دیواری مزگەوتەکانی لەبەر چوار دیوار بوون، بە پەسند نەزانیوە، بەڵکو لەبەر ئەوەیە کە لەنێو ئەو

چوار دیوارەدا ئەنجام دەدرێ، کە نوێژو طاعەتو زیکری خوایەو، فێربوونو شارەزابوونی مسوڵمانانە لە دینەکەیان، لە قورئانو سوننەت، وە پەروەردەبوونیانە لەسەردین، لە کۆتاییدا خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَلِلَّهِ ٱلْمَشْرِقُ وَٱلْمَغْرِبُ ﴾، بە بۆنەی مزگەوتێوە باسی دەکات، بەبۆنەی جوولەکەو نەصرانییو موشریکەکانەوە باسی ئەوەی کرد، کە کێ زاڵمترە لەو کەسانەی کەماڵەکانی خوا قەدەغە دەکەن، لەوەی کە ناوی خوایان تێدا بهێنرێو هەوڵدەدەن کاولیان بکەن، وێرانکردنی بەرواڵەت، یاخود بەشێوەی مەعنەویی، چونکە هەرکام لە جوولەکەو نەصرانییو موشریك، دەستیان لەو جۆرە ڕەفتارە خراپەدا هەبووە، ئنجا بەبۆنەی مزگەوتیشەوە باسی قیبلە دەکاتو دەفەرموێ: ﴿ وَلِلَّهِ ٱلْمَشْرِقُ وَٱلْمَغْرِبُ ﴾، ڕۆژهەڵاتو ڕۆژئاوا، هی خوان ﴿ فَأَيْنَمَا تُوَلُّوا۟ فَثَمَّ وَجْهُ ٱللَّهِ ﴾، ڕوو لە هەر شوێنێك بکەن، ڕووی خوا لەوێیە، واتە: ئەگەر بە قیبلەتان نەزانی ناچاربوون، ڕوو لە هەر لایەك بکەن، نوێژتان دروستە ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ ﴾، بێگومان خوا فراوانی زانایە، لە هەموو سیفاتەکانیدا فراوانە لە ڕەحمەتیدا، لە دەستەڵاتیدا، لە حیکمەتیدا... هتد، وە زانیاری فراوانیشی هەیە.

## چەند مەسەلەیەکی گرنگ

**مەسەلەی یەکەم:** لە ئیسلامدا زۆر گرنگی دراوە بە بەڵگەو، وشەکانی: (بُرْهَان)، (بَيِّنَة)، (سُلْطَان)، (حُجَّة) لە قورئاندا زۆر دووبارە بوونەتەوە، چونکە ئیسلام دینی عەقڵەو دینی عیلمە، عیلمو عەقڵیش لەسەر ئینسان پێویست دەکەن کە قسەی بێ بەڵگە نەکاتو هیچ شتێك بەبێ بەڵگە نەکاتو، هەموو شتێکی لەسەر بەڵگە بنیات بنێ، بەڵگەی عیلمیی بەڵگەی عەقڵیی، بەڵگەی وەحیی، هەر شتە بەپێی خۆی، ئەگەر قسەت کرد بەناوی خواوە بەناوی دینەوە، دەبێ بەڵگەی وەحی (نَقْل)ی بێنی، وە ئەگەر قسەت کرد بەناوی عیلمەوە، دەبێ بەڵگەی عیلمیی بێنی، وە ئەگەر بەناوی عەقڵەوە قسەت کرد، دەبێت بەڵگەی

عەقڵییو لۆژیکی (مَنطِقي) بێنی، وە هەروەها هەر جۆرە قسەیەکت کرد، دەبێ لە بابەتی خۆی بەڵگەی بۆ بێنی، ئەگەرنا قسەکەت بە پووچ لەقەڵەم دەدرێت، بۆیە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿قُلْ هَاتُواْ بُرْهَـٰنَكُمْ إِن كُنتُمْ صَـٰدِقِينَ ﴾، لە وەڵامی جوولەکەو نەصرانیی یەکاندا دەفەرموێ: بڵێ: ئەگەر ڕاست دەکەن بەڵگە بێنن، ئەگەر بەڵگەتان نەهێنا مانای وایە درۆ دەکەن، جا ئەمە ئەوەی لێ وەردەگیرێ، کە مسوڵمان دەبێت زۆر خۆی بپارێزێ لە قسەی بێ بەڵگەو، هیچ قسەیەك نەکات کە پشت ئەستوورنەبێ بە بەڵگە، مسوڵمان قورئان لەسەری پێویست دەکات کە قسەی بێ بەڵگە نەکاتو، لەسەر ئەساسی عیلم نەبێو لەسەر ئەساسی لۆژیك نەبێو لەسەر ئەساسی پشت بەستن بە بەڵگەی بەهێز نەبێ، قسە نەکات، چونکە بێ بەڵگەیی عادەتی ئەهلی کوفرە، ئەمما ئەهلی ئیمان هەمیشە ئەهلی بەڵگە (بُرْهَان)و (بَيِّنَة)و (سُلْطَّان)و (حُجَّة)ن.

**مەسەلەی دووەم:** خوا ﷻ دوو وشەی بۆ پێناسەی ئەهلی بەهەشت هێناونو، دەفەرموێ: ﴿ بَلَىٰ مَنْ أَسْلَمَ وَجْهَهُۥ لِلَّهِ وَهُوَ مُحْسِنٌ فَلَهُۥٓ أَجْرُهُۥ عِندَ رَبِّهِۦ ﴾، واتە: با، غەیری جوولەکەو نەصرانیی دەچنە بە هەشت، بەڵام ئایا ئەوانە کێن؟ ﴿مَنْ أَسْلَمَ وَجْهَهُۥ لِلَّهِ وَهُوَ مُحْسِنٌ ﴾، هەر کەسێك ڕووی خۆی بە خوا سپاردبێ، وە چاکەکاریش بێت ﴿أَسْلَمَ وَجْهَهُۥ ﴾، بەمانای ئیخلاصو ساغبوونەوە دێت، واتە: مەبەستی تەنیا خوابێ لە قسەکانیو کردەوەکانیو ڕەفتارەکانیدا، ئەوە یەك، ﴿وَهُوَ مُحْسِنٌ ﴾، وە چاکەکاریش بێ. ﴿أَسْلَمَ وَجْهَهُۥ ﴾، بەمانای ساغبوونەوە (تَجَرُّد) دێت بۆ خوا، لە هەموو شتێکدا، وە بەمانای بەتەواویی گەردن کەچبوون دێت بۆ خوا، (إحسان)یش بەمانای شوێنکەوتنی سوننەتی پێغەمبەر ﷺ دێ، وە بەمانای چاکەکارییش دێ لەگەڵ خەڵکی خوادا، واتە: ئایەتەکە بەگشتی دوو واتای هەیە:

واتای یەکەم: بۆ خوا ساغبوونەوە (مُخْلِص)بێ‌و بەشی غەیری خوای پێوەنەبێ، هەروەها شوێن سوننەتی پێغەمبەری خوا بکەوێ، واتە: ئەهلی (إخلاص)و (إتباع) بێ.

واتای دووەم: بۆ خوا گەردن کەچبێ‌و لەگەڵ خەڵکی خوادا چاکەکاربێ.

**مەسەلەی سێیەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ وَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴾، ئەم تەعبیرە لە قورئاندا لەچەند شوێنێکدا هاتوە، ئینسان بە دوو شت نیگەران دەبێت، ترسی هەبێ بۆ داهاتوو، وە پەژارە بۆ ڕابردوو بخوا، جا خوای کاربەجێ لە زۆر شوێنی قورئاندا هەردووکیان لە ئیمانداران لادەبات و، دەفەرموێ: نە ترسیان هەیە بۆ داهاتوو، نە غەم‌و پەژارەیان هەیە بۆ ڕابردوو، یانی: چی؟ یانی: ترسیان نیە بۆ داهاتوو، چونکە ئەوەی پەرێزی پاکە، بێباکەو بەرچاوی ڕووناکە، تۆ کە دەزانی چیت لە هەگبەدایە، تۆ کە ژیانەکەت بەو شێوەیە گوزەراندوە کە خوا پێی خۆشە، بەدڵنیایی کە دەگەیە خزمەت خوای پەروەردگار، خواش بەم شێوەیە مامەڵەت لەگەڵ دەکات کە پێت خۆشە، تۆ ئەگەر وا ژیای کە خوا لێت ڕازی بێ، بەدڵنیایی کاتێك کە دەمری، خواش لە تۆ ڕازی دەبێ، وەك خوا فەرموویەتی: ﴿ ...رَّضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا عَنْهُ ...﴿٨﴾ ﴾ البينة، واتە: خوا لەوان ڕازی بووە، ئەوانیش لە خوا ڕازین، خوا لەوان ڕازی بووە لە دنیاداو ئەوان لە دنیادا خوایان لە خۆیان ڕازیکردوە، بەهۆی مسوڵمانەتییەوە، خواش ئەوانی لە خۆی ڕازی کردوە لە قیامەتدا، کە خستوونیە بەهەشتەوە، ئەوە بەنسبەت ئەوە کە ترسیان نیە بۆ داهاتوو، پەژارەشیان نیە بۆ ڕابردوو، واتە: ژیانەکەیان وا نەگوزەراندوە کە پەشێمان ببنەوە، ئەوەی کە تەماشای ڕابردووی خۆی بکات‌و، ببینی واژیاوە کە خوا پێی خۆشەو، پابەندبووە بە شەرعەوەو، هەقی خوای جێبەجێکردوەو هەقی خەڵکی جێبەجێکردوە، بۆچی پەشێمان بێ‌و لەچی پەشێمانبێ‌و، بۆچی غەم‌و پەژارە دایگرێ ؟

**مەسەلەی چوارەم:** ئەگەر تەماشا بکەی جوولەکەو نەصرانیی هەردووکیان بەیەکتر دەڵێن: لەسەر هیچ نین، هەردووکیان یەکتر بە ئەهلی باطڵ دەزانن، کە دیارە هەردووکیان ڕاست دەکەن‌و، ئەمەش ئەوەی لێوەردەگیرێ کە هەمیشە دەمارگیریی (تَعَصُّب) ئینسان تووشی بیر تەسکیی‌و خۆ پەسندیی دەکات، ئینسانی مسوڵمان نابێ خۆ پەسندو دەمارگیربێ بۆ کتێبێك، بۆ مەزهەبێك، بۆ زانایەك، بۆ بۆچوونێك، بەڵکو پێویستە، ئیسلام بە فراوانی بگرێ‌و مسوڵمانان بە فراوانی تەماشا بکات، نەك دەمارگیریی (تَعَصُّب)ی هەبێ بۆ ناوێك، بۆ حیزبێك، بۆ ڕێکخراوێك، بۆ ناوونیشانێك، بێ ئەوەی کە تەماشای نێوەڕۆکەکەی بکات، بۆ نموونە: کەسی وا هەیە هەر کەسێك پێی گوترا: سەلەفیی، خۆشی دەوێ، بێئەوەی کە تەماشا بکات، داخۆ نێوەڕۆکەکەی وەك ئەوە وایە، کە سەلەفی صالح گوتوویانە یان نا ؟ هی وا هەیە هەر کەسێ پێی گوترا صۆفی زۆری خۆشدەوێ، هەر لەبەر ناوەکەی بێ ئەوەی بزانێ، ئایا بەڕاستی ساف بۆتەوە یان پڕە لە خڵتەو خاڵ ؟! وە کەسی وا هەیە هەرکەس پێی گوترا: ئەوە ئیسلامییە دەڵێ: حەتمەن مرۆڤی چاکە، وە بێئەوەی سەرنجی نێوەڕۆکی بدات، خۆشی دەوێ‌و لانگیریی دەکات ! وە هی وا هەیە هەرکەس پێی گوترا: مەلا، هەر لەبەر دەمارگیریی بۆ ناوەکەی لایەنگیری دەبێ ! کە دیارە ئەمە وەك عادەتی جوولەکەکانە، جوولەکەکان دەمارگیریی (تَعَصُّب)یان هەبوو بۆ عەینی جوولەکایەتی، نەصرانیی یەکان دەمارگیریی یان هەبوو بۆ عەینی نەصرانیی یەت، بۆیە مسوڵمان نابێ دەمارگیریی بۆ عەینی مسوڵمان بوون، یان عەینی ئیسلامیی بوون، یان عەینی سەلەفیی بوون، یان صۆفی بوون، یان فلاَن لایەنە بوون، یا چی وچی بوون هەبێ، بەڵکو دەبێ تەماشای نێوەڕۆك بکات‌و، دەبێ بە نێوەڕۆك خەڵکی هەڵسەنگێنین، نەك بەو ناوونیشانەی لەسەرخۆی دایناوە، چونکە زۆر کەس لەگەڵ ناوو نیشانەکەیدا ڕاست ناکات، ئاخر پاکەتێکی خوێ لەسەری بنووسە: هەنگوین، ئایا کە لێت خوارد هەرسوێر نیە؟! بەڵێ گرنگ نێوەڕۆکە نەك ناو.

**مەسەلەی پێنجەم:** ڕێگرتن لە مزگەوتەکانی خوا، کە ناوی خوایان تێدا بەرز بکرێتەوە، وە تێکۆشان بۆ وێرانکردنیان، وەك گوتم دوو مانا دەدا:

یەکەم: ئەوەیە کە قەدەغەی بکەی بە شێوەی ماددییو نەهێڵی مزگەوت دروست بکرێ، یاخود کە دروست کراوە کاولی بکەی.

دووەم: ئەوەتا کە نەهێڵی مزگەوت ئەرکی شەرعیی خۆی تێدا ئەنجام بدرێ: ئایەتی خوای تێدا بخوێنرێتەوە، نوێژی فەرزو سوننەتی تێدا بکرێ، یادی خواو ئیعتیکافی تێدا بکرێو، دەرسو دەوری تێدا بخوێنرێ، مسوڵمانی تێدا پەروەردە بکرێو فێری قورئانو سوننەت بکرێو، فێری شەریعەتو ئادابی شەرعیی بکرێ، هەموو ئەوانە ئەرکی مزگەوتن بەڵکو لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ کۆبوونەوەی سیاسییش لە مزگەوتدا کراوە، بەڵکو سوپاش لە مزگەوت کۆکراوەتەوەو تەوجیهاتیان وەرگرتوە، کەواتە: هەر کەسێك ڕێگا بگرێت لە مزگەوتەکان کە ئەو ئەرکە شەرعییانەیان تێدا ئەنجام بدرێن، ئەوە لەڕاستیدا تێکۆشاوە بۆ کاولکردنی مزگەوتەکان، هەرچەندە بەپارەش مزگەوت دروست بکات، بەلام دوایی کە نەیهێشت نێوەڕۆکەکەی ئەوەبێ کە خوا دەیەوێ، ئەوە لەڕاستیدا کڵاوی لەسەری مسوڵمانان ناوەو، خۆڵەمێشی کردۆتە چاوی مسوڵمانانەوە، کە خۆی بە پیاوی چاك دەربێنێو مسوڵمانان هەڵخەڵەتێنێ! ئەگەرنا تۆ ئەگەر دۆستی خوای، لێگەڕێ با ماڵی خوا ئەو ئەرکەی تێدا ئەنجام بدرێ، کە خواو پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانیان بە مسوڵمانان کردوە، کە دەبێ تێیدا ئەنجام بدرێ، کۆتایی ئەم دەرسە بە قسەیەکی شەوکانیی دەهێنم کە لە (فَتحُ القَدِير)[1]دا کردوویەتی، دەڵێ: ((وَالمرَادُ بِمَنعِ المَسَاجِد مِنْ أنْ يَذكُرَ فيها اسم الله: مَنع مَنْ يأتي إليها للصَّلاَة والتِلاَوَة والذِّكر وتعلُّم القُرآن وتعليمهِ، والمرَادُ بالسَّعي في خَرَابِهَا: هُوَ السَّعي في هَدْمِهَا، ويَجُوز أن يراد بالخَرَابِ تَعْطِيلهَا عَنِ الطَّاعَات التي وُضِعَت

---

١) فتح القدير، ج: (١)، ص: (١٧٨).

لَهَا فَيَكُونُ أعَمُّ مِن قولِهِ: ﴿ يُذْكَرَ فِيهَا اسْمُهُ ﴾، فيشملُ جميعَ مَايُمْنَع مِنَ الأمورِ التى بُنِيَتْ لَهَا المَسَاجِد، كتَعَلُّم العِلم وتَعليمِهِ والقعُودُ للإعتِكاف وإنتِظَار الصَّلاة وغَير ذَلِكَ))، واته: وە مەبەست لە ڕێگرتن لە یادی خواکردن لە مزگەوتەکاندا، بریتیە لە ڕێگریی کردن لەو کەسەی کە دێ بۆ نوێژکردنو قورئان خوێندنو زیکرو فێربوونی قورئانو فێرکردنی، وە مەبەست لە هەوڵدان بۆ کاولکردنیماڵەکانی خوا، بریتیە لە هەوڵدان بۆ وێرانکردنیان، وە دەشگونجێ مەبەست لە کاولکردنیان پەکخستنی ئەو طاعەتانەبێ کە بۆیان دروستکراون: کەواتە ئەوکاتە وێرانکردنیان واتایەکی فراوانتر دەبێ لە فەرموودەی خوا: ﴿ ... يُذْكَرَ فِيهَا اسْمُهُ ... ﴾ ناوی خوای تێدا بهێنرێ، کە ئەوکاتە هەموو ئەو شتانە دەگرێتەوە کە مزگەوتەکانیان بۆ دروستکراون، وەك فێربوونی زانیاری فێرکردنیو مانەوە بۆ ئیعتیکافو چاوەڕوانیکردنی نوێژو ...هتد، کەواتە: وەك گوتم وێرانکردنی مزگەوتەکانی خوا، مانای مەعنەوییشی هەیە، ئەویش ئەوەیە کە نەهێڵرێ ئەو طاعەتانەی تێدا ئەنجام بدرێن، کە بۆیان دروستکراون، خوای پەروەردگار یارمەتی هەموو مسوڵمانان بدا بە بەرپرسو بن دەستو سەردەستەوە، کە ڕێزی ماڵەکانی خوا بگرنو دەرگای ماڵەکانی خوا بکەنەوە، تاکو بەندەکانی خوا ئەو ئەرکە شەرعییانە لە ماڵەکانی خوا ئەنجام بدەن، کە جێگای ڕەزامەندیی خواو دڵخۆشکردنی پێغەمبەر ﷺ و مایەی سەرفرازیی دنیاو دوارۆژی خۆیانە.

سُبْحَانَكَ اللّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی بیست و چوارەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـەمان ئایەتـەکانی ژمـارە (١١٦ تـاکو ١١٩) واتـە چـوار (٤) ئایـەت لـە سـووڕەتی (البقـرة) دەگرێتـە خـۆی، لـەم چـوار ئایەتـەدا خـوا ﷻ هەنـدێ قسـەو بیـروبۆچوونی دیکەی هەڵەی جوولەکەو نەصرانیی یەکان، هەروەهـا هاوبـەش بـۆ خوا دانەرەکان، دەخاتەڕووو بەرپەرچیان دەداتەوە، پاشان خوا ﷻ ڕایدەگەیـەنێت کـە پێغەمبـەری خـوا موحەممـەدی ﷺ بەهـەق نـاردوە، کـە مـوژدەدەر بـێ بـۆ چاکەکـاران، وە ترسـێنەربێ بـۆ خراپەکـاران، وە ئاگاداریـشی کردۆتـەوە کـە ئـەو بەرپرسیار نیـە بەرانبـەر بـە کەسـانێك کـە خۆیـان وا دەکـەن شـایستەی چـوونە دۆزەخ بن، ئەمە کورتەی پێناسـەی ئەم دەرسـەمانە.

﴿ وَقَالُواْ ٱتَّخَذَ ٱللَّهُ وَلَدٗاۗ سُبۡحَٰنَهُۥۖ بَل لَّهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ كُلّٞ لَّهُۥ قَٰنِتُونَ ١١٦ بَدِيعُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ وَإِذَا قَضَىٰٓ أَمۡرٗا فَإِنَّمَا يَقُولُ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ١١٧ وَقَالَ ٱلَّذِينَ لَا يَعۡلَمُونَ لَوۡلَا يُكَلِّمُنَا ٱللَّهُ أَوۡ تَأۡتِينَآ ءَايَةٞۗ كَذَٰلِكَ قَالَ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِم مِّثۡلَ قَوۡلِهِمۡۘ تَشَٰبَهَتۡ قُلُوبُهُمۡۗ قَدۡ بَيَّنَّا ٱلۡأٓيَٰتِ لِقَوۡمٖ يُوقِنُونَ ١١٨ إِنَّآ أَرۡسَلۡنَٰكَ بِٱلۡحَقِّ بَشِيرٗا وَنَذِيرٗاۖ وَلَا تُسۡـَٔلُ عَنۡ أَصۡحَٰبِ ٱلۡجَحِيمِ ١١٩ ﴾.

## مانـای وشـە بە وشـەی ئایەتەکـان

{(وە جوولەکەو نەصرانییو هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان) گوتیان: خوا ڕۆڵەی بۆخۆی داناوە، ئەو بە دوورگیراوە (لەو جۆرە شتانە) بەڵکو هەرچی لە ئاسمانەکان‌و زەوی دایە هی ویە، هەموو بۆی ملکەچن ﴿١١٦﴾ پەیداکەری ئاسمانەکان‌و زەوی یە، وە ئەگەر کارێکی ویست بەس پێی بفەرموێ: ببە ! دەبێ ﴿١١٧﴾ وە ئەوانەی نازانن گوتیان: بۆچی خوا لەگەڵمان نادوێ، یان نیشانەیەکمان بۆ نایەت؟ ئەوانەی پێشووشیان هەر قسەی وەك وانیان دەگوت، دڵەکانیان پێکدەچن، ئێمە نیشانەکانمان بۆ کەسانێك مەبەستیان بێ زانیاری دڵنیاکەری هەبێ، ناردوون ﴿١١٨﴾ ئێمە تۆمان بە هەقەوە ڕەوانەکردوە کە موژدەدەرو ترسێنەربی، وە لەبارەی هاوەڵانی ئاگری کڵپە سەندووەوە پرسیارت لێناکرێ - کە بۆچی ئیمانیان نەهێناوە - ﴿١١٩﴾}.

## شیکردنەوەی هەندێك لە وشەکان

(سُبْحَانَهُ): لە وەڵامی ئەوانەدا کە گوتوویانە: ﴿وَقَالُواْ ٱتَّخَذَ ٱللَّهُ وَلَدًا﴾، خوا دەفەرموێ: ﴿سُبْحَانَهُ﴾ لە (سَبْح)ەوە هاتوە، (السَّبْحُ: المَرُّ السريعُ في المَاءِ، أو في الهَوَاءِ) (سبح) بریتیە لە ڕۆشتنێکی خێرا بەنێو ئاودا، یاخود لە هەوادا، (سِبَاحَة)، واتە: مەلەوانیی، کە ئینسان بەنێو ئاودا دەڕوا، خوای بێ وێنە کە باسی خڕۆکەو ئەستێرەکان دەکات، دەفەرموێ: ﴿وَهُوَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلَّيْلَ وَٱلنَّهَارَ وَٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ كُلٌّ فِى فَلَكٍ يَسْبَحُونَ ﴿٣٣﴾﴾ الأنبياء، کەواتە هەم بە ئاودا کە ئینسان ڕێبکات بە خێرایی، هەم بە هەوادا بە خێرایی جووڵە بکات ئەوە پێی دەگوترێ، (سَبْح)، ئنجا (التَّسْبِيحُ: تَنْزِيهُ الله تعالى،

وَأَصْلُهُ الْمَرُّ السريعُ فِي عِبَادَةِ اللهِ) (تَسبِيح)، واتە: بە دوورگرتنی خوا لە هەر شتێك كە شایستەی خوا نیەو ڕیشەكەیشی دەست‌و بردییە لە خواپەرستییدا.

(قَٰنِتُونَ): (القُنُوتُ: لُزُومُ الطَّاعَةِ مَعَ الخُضُوعِ) (قنوت) بریتیە لە فەرمانبەریی بۆ خوا لەگەڵ ملكەچییدا. گەردن كەچیی بۆ خوا بكەی‌و لە دەروونەوەش بۆی ملكەچ بی‌و، لێی بترسێی‌و سام‌و هەیبەت بەرانبەری هەبێ، كەواتە (قانِتُون): واتە ملكەچان بۆ خوا.

(بَدِيعُ): واتە پەیداكەری ئاسمانەكان‌و زەوی، وشەی (بَدِيع) واتە: (مُبْدِعْ) پەیداكەر یاخود داهێنەر، (إبدَاع) بریتیە لەوە كە ئینسان شتێك دابهێنێ بێ ئەوەی چاوی لە خەڵكی پێش خۆی كردبێت، لەوە وە گوتراوە (رَكِيَّة بَدِيع) واتە: (بیر)ێكی تازە هەڵكەندراو، واتە: نەك بیرێكی كۆن بێت‌و تازە كرابێتەوە (وإذَا استعملَ لِلّٰهِ تَعَالى فَهُوَ إيجَادُ الشَّيءِ بغَيرِ آلَةٍ ولاَ مادّةٍ ولاَ زمَان ولاَ مَكَان) یانی: وشەی (بَدِيع) یان (إبدَاع) كاتێ بۆ خوا بەكاردێ، یانی: ئەوە كە خوا ﷻ شتێك پەیدابكات بەبێ ئامرازو بەبێ ماددەو بەبێ كات‌و بەبێ شوێن، پێویستی بە هیچ كام لەمانە نەكات‌و یەكسەر ئەو شتە پەیدا بكات.

(قَضَىٰٓ): (القَضَاءُ: فَصْلُ الأمْرِ قَوْلاً كَانَ ذَلِكَ أو فِعلاً) (قَضَىٰٓ) كە كرداری ڕابردوویە لە (القَضَاء)ەوە هاتوە، كە (مَصْدَر) یان (اسم)ە، وشەی (القَضَاء)یش بریتیە لە یەك جیاكردنەوەی شتێك بە قسە یان بە كردەوە، واتە شتێك پەیدابكرێ یان جێبەجێبكرێ.

(أَمْرًا): (الأمرُ: الشأن، وَجَمعُهُ أمور) واتە: ئیش، كار، وە بە (أمور) كۆدەكرێتەوە، یانی: (كارەكان).

(فَإِنَّمَا) لە قورئاندا زۆرجار وشەی (إنَّمَا)مان دێتە پێش، (إنَّمَا) زانایانی شارەزای زمان دەڵێن: (أدَاة حَصْرٍ وَإثبَات) ئامرازێكە بۆ كورتكردنەوەی حوكمێك بۆ

شتێك‌و بۆ تێدا چەسپاندنی بەكاردێت، بۆ وێنە: ئەگەر گوتمان، (إنَّمَا المجاهد أحمد)، واتە: تەنیا ئەحمەد موجاهیدە، جا خوا كە دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ثُمَّ لَمۡ يَرۡتَابُواْ وَجَٰهَدُواْ بِأَمۡوَٰلِهِمۡ وَأَنفُسِهِمۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِۚ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلصَّٰدِقُونَ ﴿١٥﴾﴾ الحجرات، واتە: ئیمانداران تەنیا ئەو كەسانەن كە ئیمانیان بە خواو بە پێغەمبەری خوا هێناوە ﷺ. پاشان هیچ دوو دڵییان نیە، وە لەڕێی خوادا تێكۆشاون بە ماڵ‌و نەفسیان‌و سەروماڵیان فیدای خوا كردوە، ئەوانە ڕاست دەكەن، كەواتە: (إنَّمَا) كاتێك دەچێتە سەر شتێك، یانی: ئەو شتە حوكمێكی بۆ چەسپاوەو، لەویشدا كورت هەڵێنراوە.

(كُن فَيَكُونُ): (كُن)، واتە: ببە (فَيَكُونُ)، واتە: دەبێت، (ف) (فاء التَّعْقيب)ە، واتە: یەكسەر بەدوای ئەودا دەبێ، بە كوردی (كُن فَيَكُونُ)، واتە: ببە یەكسەر دەبێ، ئەوە ماناكەیەتی، بەڵام دوایی باسی دەكەین كە مەبەست لەم تەعبیرە چییە؟ كە خوا ﷻ لە چەند شوێنێك بەكاریهێناوە لە قورئاندا.

(ٱلۡأٓيَٰتِ): كۆی (آیة)ە، (الآية: هِي العَلامَة الظاهِرَة) بریتیە لە نیشانەیەكی ئاشكرا. وە وشەی (آیة) لە قورئان بە سێ واتایان هاتوە:

١/ بە مانای موعجیزە، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدۡ ءَاتَيۡنَا مُوسَىٰ تِسۡعَ ءَايَٰتِۭ بَيِّنَٰتٖۖ ...﴿١٠١﴾﴾ الإسراء، واتە: ئێمە نۆ موعجیزەی ڕوون‌و ئاشكرامان بە مووسا دابوون، كە دووانیان گۆچانەكەی‌و دەستی بوون، وە حەوتی دیكەش بوون، كە لە سووڕەتی (الأعراف)دا باسكراون.

٢/ مانایەكی دیكەی (آیة) بریتیە لە دیاردەو دیمەنەكان، كە خوا دروستی كردوون، خوا وەك دەفەرموێ: ﴿وَكَأَيِّن مِّنۡ ءَايَةٖ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ يَمُرُّونَ عَلَيۡهَا وَهُمۡ عَنۡهَا مُعۡرِضُونَ ﴿١٠٥﴾﴾ یوسف، واتە: زۆر نیشانە هەن لە

ئاسمانەکانو زەویدا، بەلایاندا تێپەڕ دەبن، بەس سەرنجیان نادەن، واتە: زۆر دیاردەی دروستکراو هەن، کە دیمەنی سەرنج ڕاکێشن، بەڵام تەماشایان ناکەن.

٣/ مانای سێیەمی (آیة) کە مانا زمانەوانییەکەی بریتیە لە نیشانە، بریتیە لە ڕستەکانی قورئان، ڕستەکانی قورئان ئەوانیش خوا بە ئایەتی داناون، وەك دەفەرموێ: ﴿... وَإِذَا تُلِيَتْ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُهُۥ زَادَتْهُمْ إِيمَٰنًا ...﴿٢﴾﴾ الأنفال، واتە: وە ئەگەر ئایەتەکانی ئێمەیان بەسەردا خوێنرایەوە، ئیمانیان پێی زیاد دەبێ، کە مەبەست پێی ڕستەکانی قورئانە، لەبەرئەوەی ئەوانیش وەك چۆن موعجیزە نیشانەو بەڵگەیە لەسەر گەورەیی خواو لەسەر پێغەمبەرایەتی ئەو پێغەمبەرە (علیه الصلاة والسلام) کە موعجیزەکەی لەدەستدا بووە، وە وەك چۆن دیاردەو دیمەنە خوا کردەکان، بەڵگەن لەسەر پەروەردگاریێتی خواو نیشانەینی، بە هەمان شێوە ڕستەکانی قورئانیش، بەڵگەو نیشانەن لەسەر پێغەمبەرایەتی موحەممەدو لەسەر پەروەردگاریێتی خوا ﷻ.

(يُوقِنُونَ)؛ واتە: زانیارییەکی دڵنیاکەریان هەیە، چونکە لە (یقین)ەوە هاتوە دەگوترێ: (يَقَنَ الشَّيء يَيْقَنُ يَقِيناً: ثَبَتَ وتَحقَّق وَوضحَ ويُقَالُ: يَقِنَ الشَّيءُ وأيقَنَهُ ويَقَّنَهُ واستَيْقَنَهُ)، واتە: شتەکە چەسپاو ڕوونبۆوەو ئاشکرابوو، ئنجا (راغب الأصفهاني) دەڵێ: (وَهُوَ سُكُونُ الفَهْمِ مَعَ ثَبَاتِ الحُكْمِ)، واتە: (یَقین) بریتیە لەوە کە تێگەیشتنێکت هەبێ، تەواو دڵت لەسەری دامەزرابێ، وە حوکمەکە لە دڵتدا چەسپابێ بەرانبەر بەو شتە، یانی: کە گوتمان: یەقینمان هەیە بەوە کە ڕۆژی دوایی دێ، واتە: تۆ هاتنی دواڕۆژت لەلا شتێکی سەلمێنراوەو هیچ دوو دڵییت لە بەرانبەریدا نەماوە.

(بَشِيرًا)؛ (البَشير هُوَ المُبَشر)، واتە: دڵخۆشکەر، یان مژدەدەر، دەگوترێ: (وَأَبشَرْتُ الرَجُل وَبَشَرْتهُ: أخْبَرتهُ بسَارٍّ فانبَسطتْ بَشَرةُ وجهه)، ئەگەر

خەبەرێکی خۆشت بە کەسێکدا کە ڕووی بگەشێتەوەو ڕووی خۆشبێ، دەڵێی: (بَشَرْتُهُ) بۆچی؟ چونکە هەواڵێکت پێداوە، دەم‌وچاوی گەشاوەتەوە.

(وَنَذِيرًا ): واتە: (مُنذِر) ترسێنەر، یان وریاکەرەوە (الإِنْذارُ: إِخْبَارٌ فيهِ تَخْوِيفٌ، كَمَا أَنَّ التَّبْشِيرَ إِخْبَارٌ فيهِ سرورٌ)، (إِنذَار) بریتیە لە هەواڵدانێك كە ترساندنی لەگەڵدابێ، هەروەك چۆن (تَبشير) بریتیە لە هەواڵ پێدانێك كە دڵ خۆشیی تێدابێ.

(الْجَحِيمِ): (الجَحْمَة: شدَّةُ تأجُّجِ النَّار)، (جَحْمَة) بریتیە لە ئاگرێك كە گڵپە دەكات، (جحيم)، واتە: ئاگری گڵپەسەندوو.

## هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتەکان

١/ هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو ڕستە قورئانییەی کە دەفەرموێ: ﴿وَقَالُواْ اتَّخَذَ اللَّهُ وَلَدًا﴾، ((قَالَ الوَحدي: نَزَلَتْ في اليَهُود حَيْث قَالُوا: عُزَيرٌ ابنُ الله، وفي نَصارَى نَجْرَان حَيْث قَالُوا: المَسيحُ ابنُ الله، وفي مُشرِكي العَرَب حَيْث قَالُوا: المَلائِكَةُ بَنَات الله)) (أسباب النُّزول لِلواحدي)، واتە واحیدیی دەڵێ: دەربارەی جوولەکەکان هاتە خوارێ، کە جوولەکەکان دەیانگوت عوزێر کوڕی خوایە، وەك دەفەرموێ: ﴿وَقَالَتِ الْيَهُودُ عُزَيْرٌ ابْنُ اللَّهِ ...﴿٣٠﴾﴾ التوبة، واتە: جوولەکەکان گوتیان: عوزێر کوڕی خوایە (پاکیی بۆ خوا)، وە دەربارەی نەصرانیی یەکان، کە گوتیان: عیسا کوڕی خوایە، وەك دەفەرموێ: ﴿... وَقَالَتِ النَّصَارَى الْمَسِيحُ ابْنُ اللَّهِ ...﴿٣٠﴾﴾ التوبة، واتە: نەصرانیی یەکان گوتیان: مەسیح (واتە: عیسا) کوڕی خوایە، وە دەربارەی هاوبەش بۆ خوا دانەرەکانی عەرەب کە ئەوانیش دەیانگوت: فریشتەکان کچی خوان، (وە شەییتانەکەنیش کوڕینی)، وەك خوا ﷻ لە سووڕەتی (الأنعام)دا دەفەرموێ: ﴿وَجَعَلُواْ لِلَّهِ

شُرَكَآءَ ٱلْجِنَّ وَخَلَقَهُمْ ۖ وَخَرَقُوا۟ لَهُۥ بَنِينَ وَبَنَٰتٍۭ بِغَيْرِ عِلْمٍ ۚ سُبْحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يَصِفُونَ ﴿١٠٠﴾ ﴾ الأنعام، واتە: وە هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان هاوبەشی جندیان بۆ خوا دانان کە هەر خۆیشی دروستیکردوون، وە کورو کچیان بۆ خوا هەڵبەستن بەبێ زانیاری {گوتیان: نێرینەکانی (جن) کوڕی خوان، وە فریشتەش کچی خوان} پاکیی‌و بەرزیی بۆ خوا لەوەی کە وەسفی خوای پێدەکەن، دوایی دەفەرموێ: ﴿ بَدِيعُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۖ أَنَّىٰ يَكُونُ لَهُۥ وَلَدٌ وَلَمْ تَكُن لَّهُۥ صَٰحِبَةٌ ۖ ... ﴿١٠١﴾ ﴾ الأنعام، واتە: پەیداکەری ئاسمانەکان‌و زەوییە، مندالی چۆن پەیدادەبێ، کە هاوسەری نەبێت؟ جا توێژەرەوانی قورئان زۆربەیان دەڵێن: لەسەر هەرکام لە جوولەکەو نەصرانییو لە هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان، ئەم ئایەتە هاتۆتە خوارێ.

٢/ هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو ئایەتەی دیکە کە دەفەرموێ: ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ لَوْلَا يُكَلِّمُنَا ٱللَّهُ أَوْ تَأْتِينَآ ءَايَةٌ ... ﴾ {(عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: وَقَالَ رَافِعُ بْنُ حُرَيْمِلَةَ لِرَسُولِ اللّهِ ﷺ يَا مُحَمّدُ إنْ كُنْت رَسُولاً مِنَ اللّهِ كَمَا تَقُولُ، فَقُلْ لِلّهِ فَلْيُكَلّمْنَا حَتّى نَسْمَعَ كَلامَهُ، فَأَنْزَلَ اللّهُ تَعَالَى ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ لَوْلَا يُكَلِّمُنَا ٱللَّهُ أَوْ تَأْتِينَآ ءَايَةٌ ... ﴾) (تفسير القرآن العَظِيم، ج: (١)، ص (٢٣٥)}، واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس دەڵێ: ڕافیع کوڕی حورەیملە (ئەوە یەکێك بووە لە زانای جوولەکەکان)، هاتە لای پێغەمبەری خوا ﷺ گوتی: ئەی موحەممەد! ئەگەر ڕاست دەکەی پێغەمبەری خوای، بە خوا بڵێ با قسەمان لەگەڵ بکات‌و بماندوێنێ، بۆ ئەوەی قسەی خوا ببیستین، {وە پێمان بڵێ‌و پێمان ڕابگەیەنێ کە تۆ پێغەمبەری خوای}[1]، خواش ﷻ ئەم ئایەتەی نارده خوارێ.

---

[1]) ئەوەی نێوان دوو کەوانەکە خۆم زیادم کردو پێم وایە سیاقەکە دەیگەیەنێ.

## مانـــای گشـــتی ئایەتەکـــان

خــوا ﷻ هــەر لــە زنجــیرەی باســکردنی هەڵوێســتە پــڕ غەڵــەتو پەڵــەتەکانی جوولــەکەو نەصرانیی یەکانو هاوبەش بۆ خوا دانەرەکـاندا، دەفەرموێ: ﴿ وَقَالُوا۟ ٱتَّخَذَ ٱللَّهُ وَلَدًا ﴾، وە قــسەیەکی دیکــەی زۆر بێجــێیان کــرد گوتیــان: خــوا ڕۆڵــەی هەیــەو منــداڵی بۆخــۆی دانــاوە، وشــەی (وَلَـد) لــە زمــانی عەرەبیــدا هــەم کــوڕ دەگرێتــەوە، هــەم کــچ، (ابـن)، واتــە: کــوڕو (بنـت)، واتــە: کــچ، بــەڵام (وَلَـد) هەردووکــیان دەگرێتــەوە. ﴿ سُبْحَـٰنَهُۥ ﴾، واتــە: خــوا دووره لــەوەو خــوا بــە دوورگیــراوە لەوە کە ڕۆڵـەو منـداڵی هـەبێت ﴿ بَل لَّهُۥ مَا فِى ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ كُلٌّ لَّهُۥ قَـٰنِتُونَ ﴾، بــەڵکو هەرچــی لــە ئاسمانــەکانو زەوی دایــە، هــی خوایــە، هەرچــی لــە ئاسمانــەکانو زەویــدا هەیــە بــە ژیانــدارو بــێ ژیانــەوەو، بــەخاوەن هەســـتو بێهەســـتەوە، هــەمووی بــۆ خــوا ملکــەچن، هیــچی لــە یاســای خــوا دەرنــاچێ‌و، هــەمووی بــۆ خــوا ملکــەچە، چ ئــەوەی کــە بــە ئیختیــاری خــۆی ملکەچــە کــە ئیمانــدارانن، لــە جــندو مرۆڤ، وە ئــەوەی کــە بــە ناچاریی ملکــەچەو ناتوانــێ لــە یاســاو سوننەتی خــوا لابدا، وەك مانگو ئەســتێرەو خڕۆکــەکانو کەهکەشــانەکان، وە ڕووەكو ژیانــداران، بــە ئەهــلی کوفریــشەوە لــە مرۆڤ و جنـد، ئــەوانیش بــە ناچاریی ملکــەچن بــۆ خــوا، لــەو بەشــەی ژیانیانــدا کــە نــاتوانن لــە یاســاکانی خــوا دەرچــن، کــە دەبــێ: بخــەونو بخــۆنو بخــۆنەوەو بەچــاو ببیــننو بــە لاق بــڕۆنو ...هتــد، ئــەوانیش لــەوەدا نــاتوانن لــە ســوننەتو یاسای خــوا لابــدەن، ئنجا خــوای پەروەردگــار، بەڵگــە دێنێتــەوە کــە ئــەوە قــسەیەکی زۆر بێجێیــەو دەفــەرموێ: ﴿ بَدِيعُ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ﴾ خــوا داهێنــەری ئاسمانــەکانو زەوییــە، پەیداکــەری ئاسمانــەکانو زەوییــە، بەشــێوەیەك کــە تەماشای کەســی دیکــەی نــەکردووەو لاســای کەســی دیکــەی نــەکردۆتــەوە، چــونکە (إبـدَاع) ئەوەیــە تــۆ شــتێك دابهێنــی لاســایی

کەسی پێش خۆتت نەکردبێتەوە ﴿ وَإِذَا قَضَىٰٓ أَمۡرٗا فَإِنَّمَا يَقُولُ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ﴾، وە هەر کات کارێکی ویست ئەنجامی بدا، بەس پێی دەفەرمویٚ ببە، یەکسەر دەبێت، لێرەدا زۆربەی هەرە زۆری توێژەرەوانی قورئان دەڵێن: لێرە مەبەست ئەوە نیە کە خوا ﷻ کە بیەوێ شتێك پەیدابکات بە عەرەبی پێی بفەرموێ: (كُنْ)، یان بە کوردی بفەرموێ: ببە، یان بە فارسی پێی بفەرموێ: پیداشوید ! یان بە ئینگلیزی ...هتد، مەبەست ئەوە نیە، بەڵکو مەبەست ئەوەیە: خوا ﷻ کاتێك بیەوێ شتێك پەیدابکات، وەك ئێوە نیە پێویستی بە هۆیەکان بێت، وە پێویستی بە ئامرازەکان بێت، بەڵکو بەس ویستەکەی بەسە بۆ ئەوەی کە پەیدا ببێ، بەس خوا بیەوێ، یەکسەر پەیدا دەبێت، جا لێرەدا بۆ ئەوەی لە عەقڵی ئێمە نزیکی بخاتەوە، نزیکترین شت بۆ ئەوە کە ئێمە تێبگەین چۆن ئیرادەو ویستی خوا هەر کە رووی کردە شتێك یەکسەر پەیدا دەبێت، ئەوەیە کە ئێمە لە عورفی خۆماندا بە شتێك بڵێین: ببە، یەکسەر پەیدا بێت، ئاوا خوای پەروەردگار ئیرادەکەی هێندە بەخێرایی شتەکان پەیدا دەکات، وەك ئەوە وایە دیارە ئێمە هەر بەو شێوازە حاڵی دەبین لە جێبەجێبوون (نفوذ)ی ویست‌و خواستی خوا، بۆ پەیداکردنی شتەکان. کەواتە: خوایەك هێندە خاوەنی دەستەڵات بێ، پێویستی بە رۆڵە نیە، چونکە خەڵك بۆیە پێویستییان بە منداڵ‌و بە رۆڵەیە، تاکو بوونی خۆیانیان تێدا ببیننەوە، یان بۆ ئەوەی میراتیان لێبگرن، یان بۆ ئەوەی رێ‌و شوێنیان ون نەکەن، بەڵام خوا ﷻ خاوەنی هەموو شتێکەو هیچ شتێك لە وێنەی ئەودانیە، کەواتە: پێویستی بە رۆڵەو بە منداڵ نیە، وە شایستەی ئەوە نیە کە رۆڵەو منداڵی هەبێت‌و ناشگونجێ.

پاشان دێتە سەر باسی مەسەلەیەکی دیکەو دەفەرموێ: ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ لَا يَعۡلَمُونَ لَوۡلَا يُكَلِّمُنَا ٱللَّهُ أَوۡ تَأۡتِينَآ ءَايَةٞ ﴾، زۆربەی توێژەرەوانی قورئان دەڵێن: لێرەدا مەبەست لە: {ئەوانەی کە نازانن}، ئەو کافرانەن کە هیچ شتێ دەربارەی خوا ﷻ ، وە دەربارەی ئەو شتانەی کە لەرێی وەحییەوە دێن، نازانن، جا

دەفەرمویّ: ئەوانەی کە نازانن گوتیان: ﴿ لَوْلَا يُكَلِّمُنَا ٱللَّهُ أَوْ تَأْتِينَآ ءَايَةٌ ﴾، دەبووایە خوا خۆی بماندوێنیّ، یان نیشانەو موعجیزەیەکمان بۆ بێت، بۆ ئیسپاتی ئەوە کە موحەممەد پێغەمبەری خوایە ﷺ، خواش لە وەڵامیاندا دەفەرمویّ: ﴿ كَذَٰلِكَ قَالَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِم مِّثْلَ قَوْلِهِمْ ﴾، هەر ئاوا ئەوانەی پێش وانیش هەمان قسەی وانیان کرد، (واتە: گەلانی کافری پێش ئەوانیش هەمیشە بیانوویان بۆ پێغەمبەرانیان ئەوە بوو یان دەیانگوت: خوا قسەمان لەگەڵ بکات، یان دەیانگوت: با خوا نامەیەك بنێریّ کە فلاّن کەس پێغەمبەری منە، یان ئەو موعجیزەو بەڵگەیەی ئەو پێغەمبەرە بۆی دەهێنان پێی ڕازی نەدەبوون‌و، دەیانگوت: دەبیّ شتێکی دیکەمان بۆ بێنی، وە دوایی کە موعجیزەشی بۆ دەهێنان، هەر ئیمانیان پیّ نەدەهێنا، وەك گەلی فیرعەون کە ئیمانیان بە مووسا نەهێنا، لەگەڵ ئەوەشدا کە خوا نۆ موعجیزەی پیّدابوون، وە جوولەکەکان ئیمانیان بە عیسا نەهێنا، کە ئەو هەموو موعجیزانەی هەبوون، وە گەلی (ثَمُود) ئیمانیان بە (صَالح) نەهێنا، کە حوشتری بۆ لە تاشە بەردێکی گەورە دەرهێنان، هەروەها ئەو پێغەمبەرانە (علیهم الصلاة والسلام) کە خوا گەلەکانی لەبەین بردوون، هەموویان خاوەن موعجیزە بوون، کەواتە: هیچ گەل‌و میللەتێك پەکی لەسەر موعجیزە نەکەوتوە، بەلاّم هەر نەیانویستوە ئیمان بێنن، بۆیە دەفەرمویّ: ﴿ كَذَٰلِكَ قَالَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِم مِّثْلَ قَوْلِهِمْ ﴾، ئەوانەی پێش وانیش هەر قسەی وەك وانیان دەکرد ﴿ تَشَٰبَهَتْ قُلُوبُهُمْ ۗ قَدْ بَيَّنَّا ٱلْءَايَٰتِ لِقَوْمٍ ﴾، دڵیان وێك دەچیّ، بەدڵنیایی ئێمە ئایەتەکانی خۆمانمان جوان ڕۆشن کردۆتەوە، موعجیزەو بەڵگەکانی خۆمان جوان ڕۆشن کردۆتەوە بۆ کەسانێك کە مەبەستیان بیّ‌و بیانەویّ دڵنیابن.

لە کۆتاییدا دەفەرمویّ: ﴿ إِنَّآ أَرْسَلْنَٰكَ بِٱلْحَقِّ بَشِيرًا وَنَذِيرًا ﴾، ئێمە تۆمان ناردوە بە هەق، موژدەدەری‌و ترسێنەری، دڵخۆشکەری‌و ورپاکەرەوەشی، واتە: تۆ ئەی موحەممەد! ﷺ بە هەقەوە ڕەوانەکراوی، ئەگەر ئەوانە لە هەق

دەگەڕێن، وە موژدەدەریشی بۆ ئەوانەی کە ئیمانت پێ دەهێنن و موژدەی ئەوەیان پێدەدەی کە لە دنیاو دوارۆژدا سەرفرازن و خۆشبەختن، وە ترسێنەریشی بۆ ئەوانەی کە بڕوات پێ ناهێنن، کە لە دنیاو دوارۆژدا زەرەر دەکەن ﴿وَلَا تُسْـَٔلُ عَنْ أَصْحَٰبِ ٱلْجَحِيمِ﴾، وە دەربارەی هاوەڵانی ئاگری گڵپەسەندوو (دۆزەخ) تۆ بەرپرسیار نیو پرسیارت لێناکرێ، واتە: ئەگەر ئەوانە ئیمان ناهێنن، تۆ تەنیا ئەوەت لەسەرە ئاگاداریان بکەیەوەو موژدەیان پێبدەی بە بەهەشت ئەگەر ئیمان بێنن و، بیانترسێنی لە دۆزەخ ئەگەر ئیمانیان نەهێنا، جا ئەگەر هەر ئیمانیان نەهێنا، ئەوە تۆ بەرپرسیارنیو، تۆ هەر هێندە بەرپرسیاری کە پێیان ڕابگەیەنی، وەك خوا ﷻ لە شوێنێکی دیکەدا فەرموویەتی: ﴿...فَإِنَّمَا عَلَيْكَ ٱلْبَلَٰغُ ...﴿٢٠﴾﴾ آل عمران، تەنیا ڕاگەیاندن لەسەر پێغەمبەری خوایە ﷺ، کە پێی ڕاگەیاندن ئەوجار بەرپرسیارێتی دەکەوێتە سەرشانی ئەوانەی کە پێیان ڕاگەیەنراوە.

## چەند مەسەلەیەکی گرنگ

**مەسەلەی یەکەم:** کە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿وَقَالُوا۟ ٱتَّخَذَ ٱللَّهُ وَلَدًا﴾، بۆ زانیاریتان ڕۆڵەو منداڵ پاڵدانە لای خوا، خاڵی هاوبەشی نێوان ئەهلی کوفرە چ جوولەکەکان چ نەصرانییەکان، چ بتپەرستەکان، مەگەرچۆن ئەگەرنا هەموویان ڕۆڵەو منداڵ پاڵدەدەنە لای خوا ﷻ، بۆیە لە فەرمایەشتێکدا پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {(قَالَ اللهُ تَعَالَى: كَذَّبَنِي ابْنُ آدَمَ وَلَمْ يَكُنْ لَهُ ذَلِكَ، وَشَتَمَنِي وَلَمْ يَكُنْ لَهُ ذَلِكَ، فَأَمَّا تَكْذِيبُهُ إِيَّايَ فَزَعَمَ أَنِّي لا أَقْدِرُ أَنْ أُعِيدَهُ كَمَا كَانَ، وَأَمَّا شَتْمُهُ إِيَّايَ فَقَوْلُهُ: لِي وَلَدٌ فَسُبْحَانِي أَنْ أَتَّخِذَ صَاحِبَةً أَوْ وَلَداً) (رَوَاهُ الْبُخَارِيُّ بِرقم: (٤٤٨٢)، عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنه}، واتە: خوای بەرز فەرمووی: ئادەمیزاد منی بەدرۆ زانی، درۆکردنی پاڵدایە لای من، ئەوەشی بۆ نەبوو، وە جنێوی پێدام و ئەوەشی بۆ نەبوو، (نەدەبوو وابکات)، ئەوە کە منی بە درۆ زانیوە ئەوەیە کە گومانی وابووە کە من ناتوانم زیندووی

بکەمەوە (لە حاڵێکدا کە من هەواڵم پێداوە زیندووی دەکەمەوە، مانای وایە منی بە درۆ زانیوە)، وە جنێودانەکەشی بەمن ئەوەیە کە گوتوویەتی: من ڕۆڵەو منداڵم هەیە پاکیی بۆ من کە هاوسەرم هەبێت، یاخود ڕۆڵەم هەبێ.

**مەسەلەی دووەم:** خوای تاك و پاك ئاوا بەرپەرچی ئەوانە دەداتەوە کە ڕۆڵەی پاڵدەدەنە لا، دەفەرموێ: ﴿ سُبْحَٰنَهُۥ ۖ بَل لَّهُۥ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۖ كُلٌّ لَّهُۥ قَٰنِتُونَ ﴾، پاکیی بۆ وی، بەڵکو هەرچی لە ئاسمانەکان و زەوییە، هی ویەو هەمووشیان بۆی ملکەچن، واتە: خوا پێویستی بە منداڵ ناکات، چونکە هەموو بوون موڵکی خوایەو هەموو دروستکراوەکان دروستکراوی خۆینی، واتە: خوا ﷻ پێویستی بە غەیری خۆی نیە هەتاکو ڕۆڵەو منداڵیان لە نێودا بۆخۆی پەیدابکات.

**مەسەلەی سێیەم:** ئەوە کە خوای بێ وێنە دەفەرموێ: ﴿ بَدِيعُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ﴾، لە دەرسی فیزیادا قوتابیان ئەوە دەخوێنن، کە ماددە ئەوەیە نە دروست دەبێت و نە لەبەین دەچێ. جا یەکێ بۆی هەیە بڵێ: باشە خوا ئەو بوونەوەرەی لە چی دروست کردوە؟ لە وەڵامدا دەڵێین: لەڕاستیدا ئەو یاسا فیزیاییە لەنێو بازنەی بەشەردا ڕاستە، بەشەر ناتوانێ نە ماددە لەبەینبەرێ و نە دروستیشی بکات، بەڵام ئەگەر بەشەر خوا قیاس بکاتە سەر خۆی، زۆر ناماقووڵیی و سەهوی کردوە، چونکە بەشەر دروستکراوەو ناتوانێ شت پەیدابکات، وە ناتوانێ شت لەبەین بەرێ، بەڵام بەدیهێنەر (خالق) ﷻ کە غەیری خۆی هەمووی دروستکراو (مَخْلُوق)یەتی و پەیدای کردوەو، هەرکاتێکیش بیەوێ دەتوانێ لەبەینی ببات، ئنجا لەڕاستیدا جیاوازی سەرەکی نێوان خوا ﷻ و دروستکراوەکانی هەر ئەوەیە کە بەدیهێنەر (خالق) دەتوانێ شت پەیدابکاو لەبەینیشی بەرێ، بەڵام بەدیهێنراو (مَخْلُوق) ناتوانێ نە هیچ پەیدا بکاو نەهیچ لەبەینبەرێ، بەس دەتوانێ گۆڕانی بەسەردا بێنێ.

**مەسەلەی چوارەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ كُن فَيَكُونُ ﴾، ئایا مەبەست پێی قسەیە، یان ئەوە ڕەمزو هێمایە؟ زۆربەی تویێژەرەوانی قورئان دەڵێن: ئەوە نیە کە خوا ﷻ بە شتێك بفەرموێ: ببە، ئەویش پەیدابێ، بەڵکو مەبەستی ئەوەیە کە ئیرادەو مەشیئەتی خوا هەر کاتێ ڕووی کردە شتێك، بۆ ئەوەی پەیدای بکات، یەکسەر پەیدادەبێت بێ دواکەوتن، پێشتریش ئەم مەسەلەیەمان ڕوونکردەوە.

**مەسەلەی پێنجەم:** کە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ إِنَّآ أَرۡسَلۡنَٰكَ بِٱلۡحَقِّ بَشِيرٗا وَنَذِيرٗا ﴾، ئەوە خۆی دوو سێ بەڵگەی تێدایە لەسەر پێغەمبەرایەتی موحەممەد ﷺ:

١) ﴿ إِنَّآ أَرۡسَلۡنَٰكَ بِٱلۡحَقِّ ﴾، تۆ وەرە لە قورئانو لە سوننەت بکۆڵەوە، سەد (١٠٠) ساڵ لێیان بکۆڵەوە، هەر زیاتر دەگەیە یەقین، کە هەمووی هەقە، لەڕووی عەقیدەوە، لە ڕووی عیبادەتەوە، لە ڕووی موعامەلاتەوە، لە هەموو ڕوویێکەوە.

٢) ئنجا هەموو ئەوانەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ موژدەی پێداونو، بە قسەیان کردوە، خۆشبەخت بوون لە دنیاو لە دوارۆژدا.

٣) وە ئەوانەی کە ترساندوونیو بە قسەیان نەکردوە، تەماشا دەکەی بەدبەخت بوون، تەماشا بکە ئەبووبەکری صیددیقو عومەری کوڕی خەتتاب خوا لێیان ڕازی بێ لە کوێ لە دنیاو لە دوارۆژدا، وە ئەبووجەهلو نەضری کوڕی حارث لە کوێ ؟!، کەواتە: موژدەدانی پێغەمبەر ﷺ بەوانەی کە ئەو موژدەیەیان قەبووڵ کردوەو فەرمانبەریی خواو پێغەمبەری خوایان ﷺ کردوەو، ئەوە دیارە لە عالەمی واقیعدا بەرجەستە بووە لە کەسانێکدا کە بەقسەی پێغەمبەریان کردوە ﷺ، وە هەروەها ترساندنەکەشی لە کەسانێکدا بەرجەستە بووە، کە لە فەرمانی خوا لایانداوە، ئەوەتا تووشی بەدبەختیی ڕووڕەشییو ڕۆژڕەشی بوون.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

٥٧

# دەرسی بیستو پێنجەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان لە ئایەتی (١٢٠ تاکو ١٢٣) واتە چوار (٤) ئایەت دەگرێتە خۆی، لەم چوار ئایەتەدا خوا ﷻ باسی هەڵوێستی جوولەکەو نەصرانییەکانمان بۆ دەکات، چ خراپەکانیان، چ چاکەکانیان، وە دواییش دێتە سەر دوایین فەرمایشتی خۆی کە ئاڕاستەی جوولەکەکانی دەکات، هەمان قسەی کە لە سەرەتای ئەم زنجیرە دەرسەدا کە لە ئایەتی چل (٤٠)ەوە دەستی پێدەکاتو دەفەرموێ: ﴿ يَٰبَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ ٱذۡكُرُواْ نِعۡمَتِيَ ٱلَّتِيٓ أَنۡعَمۡتُ عَلَيۡكُمۡ وَأَوۡفُواْ بِعَهۡدِيٓ أُوفِ بِعَهۡدِكُمۡ وَإِيَّٰيَ فَٱرۡهَبُونِ ﴾، واتە: هەرهەمان ڕستە کە کردوویەتە دەستپێک، کردووشیەتی بە کۆتایی دواندنەکانی لەگەڵ خاوەن کتێبەکاندا بەگشتیو جوولەکەکان بەتایبەتی.

﴿ وَلَن تَرۡضَىٰ عَنكَ ٱلۡيَهُودُ وَلَا ٱلنَّصَٰرَىٰ حَتَّىٰ تَتَّبِعَ مِلَّتَهُمۡۗ قُلۡ إِنَّ هُدَى ٱللَّهِ هُوَ ٱلۡهُدَىٰۗ وَلَئِنِ ٱتَّبَعۡتَ أَهۡوَآءَهُم بَعۡدَ ٱلَّذِي جَآءَكَ مِنَ ٱلۡعِلۡمِ مَا لَكَ مِنَ ٱللَّهِ مِن وَلِيّٖ وَلَا نَصِيرٍ ١٢٠ ٱلَّذِينَ ءَاتَيۡنَٰهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ يَتۡلُونَهُۥ حَقَّ تِلَاوَتِهِۦٓ أُوْلَٰٓئِكَ يُؤۡمِنُونَ بِهِۦۗ وَمَن يَكۡفُرۡ بِهِۦ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡخَٰسِرُونَ ١٢١ يَٰبَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ ٱذۡكُرُواْ نِعۡمَتِيَ ٱلَّتِيٓ أَنۡعَمۡتُ عَلَيۡكُمۡ وَأَنِّي فَضَّلۡتُكُمۡ عَلَى ٱلۡعَٰلَمِينَ ١٢٢ وَٱتَّقُواْ يَوۡمٗا لَّا تَجۡزِي نَفۡسٌ عَن نَّفۡسٖ شَيۡـٔٗا وَلَا يُقۡبَلُ مِنۡهَا عَدۡلٞ وَلَا تَنفَعُهَا شَفَٰعَةٞ وَلَا هُمۡ يُنصَرُونَ ١٢٣ ﴾.

## مانای وشه به وشەی ئایەتەکان

((وه هەرگیز جوولەکەو دیانەکان لێت ڕازی نابن، هەتا شوێن ڕێبازەکەیان نەکەوی، بڵێ: بێگومان تەنیا ڕێنمایی خوا ڕێنمایی یە، وه ئەگەر پاش هاتنی ئەو زانیارییەی بۆت هاتوه بکەویە دوای ئارەزووەکانیان، ئەوه لەلایان خواوه هیچ دۆست‌و پشتیوانت نابن ﴿١٢٠﴾ ئەوانەی کتێبمان پێداون‌و وەك شایستەیەتی دەیخوێننەوە، ئائەوانه بڕوایان پێیەتی، بەڵام هەر کەسێك بڕوای پێنەکات، ئەوه زیانباران هەرخۆیانن ﴿١٢١﴾ ئەی وەچەی ئیسرائیل! چاکەو نیعمەتی من کە لەگەڵم کردوون لەبەرچاوتان بێ هەروەها ئەوه کە بەسەر جیهانییاندا پەسندم کردوون (واتە: پێشینەکانتان) ﴿١٢٢﴾ وه پارێز له ڕۆژێك بکەن کە کەس دادی کەس نادات، وه هیچ کەس قەرەبووی (فدیة)ی لێ وەرناگیرێ وه تکاکردن سوودی پێ ناگەیەنێ‌و سەریش ناخرێ ﴿١٢٣﴾)).

## شیکردنەوەی هەندێك لە وشەکان

(وَلَن): (لَـنْ: كَلِمَةُ تَأكِيدِ وتَأييدِ) ئەم وشەیە بەکاردەهێنرێ بۆ جەخت کردنەوە لەسەر شتێك، وه بۆ ئەوە کە ئەو شتە هەرگیز نابێ، جا کە لێرەدا دەفەرموێ: ﴿ وَلَن تَرۡضَىٰ عَنكَ ٱلۡيَهُودُ وَلَا ٱلنَّصَٰرَىٰ ﴾، واتە: هەرگیز جوولەکەو نەصرانیی یەکان پێت ڕازی نابن.

(تَرْضَىٰ): (رَضِيَه: قَبِلَهُ واختَارَهُ) شتێکی قەبووڵ کردو هەڵیبژارد (ورَضِيَهُ رَآهُ أهلاً لَـهُ)، واتە: ئەو شتەی بەشایستە بینی (وَرضِيَ مِنهُ اكتَفَى بِهِ)، واتە: ئیکتیفای بەوەندە کردو وازی لێ هێنا.

(مِلَّتَهُمْ): (المِلَّةُ كالدِّينِ، وَهُوَ اسْمٌ لِمَا شَرَعَ اللهُ تعالى لِعِبادِهِ عَلَى لِسَانِ الأنبِيَاءِ لِيتَوَصَّلُوا بِهِ إلى جِوارِ اللهِ، والفَرْقُ بَيْنَهَا وبَيْنَ الدِّينِ أنَّ المِلَّةَ

لا تُضافُ إلاَّ إلى النَّبيِّ ﷺ)، واتە: وشەی (المِلَّةُ) هەر بەمانای (دین) دێت، وە ناوە بۆئەوە کە خوای بێ هاوتا لەسەر زمانی پێغەمبەرانی (علیهم الصلاة والسلام) وەك بەرنامەیەك بۆ بەندەکانی داناوە، تاکو پێی بگەن بەرەزامەندیی خواو پێیبگەنە دراوسێیەتی خوا، بەلاّم ئایا وشەی (المِلَّةُ) لەگەلّ (دین)دا جیاوازی چییە؟ هەلّبەتە لە زمانی عەرەبیدا، ئەگەرنا وشەی میللەت لە زمانی کوردیدا بەمانای گەلە، دەگوترێ: میللەتی کورد، بەلاّم ئەوە بەکارهێنانێکی عورفییە، ئەگەرنا لە بەکارهێنانی قورئاندا وشەی (المِلَّةُ) یانی دین، بەلاّم جیاوازییان چییە؟ جیاوازییان ئەوەیە کە دین پالّ دەدرێتە لای خوا (دین الله)، وەك دەفەرموێ: ﴿ وَرَأَيْتَ ٱلنَّاسَ يَدْخُلُونَ فِى دِينِ ٱللَّهِ أَفْوَاجًا ﴿٢﴾ ﴾ النصر، ناگوترێ دینی موحەممەد ﷺ، بەلّکو دەگوترێ، میللەتی موحەممەد ﷺ، میللەتی ئیبراهیم ﷺ، واتە: ئەو دینەو ئەو ڕێبازەی لەسەری بوونە... کەواتە: دینی ئیسلام ئەگەر پالّبدرێتە لای خوا، دەگوترێ: دین، بەلاّم ئەگەر پالّ بدرێتە لای موحەممەد ﷺ دەگوترێ: میللەت، واتە: ئەو ڕێبازو ئەو شێوە دینداریيەی کە ئەو گرتوویەتەبەرو پەیڕەویی لێکردوە.

(هُدَى): (الهِدَايَةُ دَلاَلَةٌ بِلُطْفٍ، وهِيَ عَلَى ثَلاَثَة دَرَجَات: عَام للعَالَمِين، خَاص للإنْسَان والجن، وخَاص بالمُتَّقِين) (هداية) بریتیە لە ڕێنمایی کردنێکی بە پەنهانیيو بە لەباریی، وە هیدایەت بەگشتی سێ پلەی هەیە، واتە لە قورئاندا بە سێ واتا بەکارهاتوە:

یەکەم: واتای یەکەمی هیدایەت ڕێنمایی خوایە ﷻ بۆ هەموو دروستکراوەکان، واتە: ئەو سیستەمو یاسایەی کە خوا دایناوە بۆ بوونەوەر، وەك کاتێك فیرعەون پرسیار لە مووسا ﷺ دەکاتو دەلّێ: ﴿ فَمَن رَّبُّكُمَا يَـٰمُوسَىٰ ﴿٤٩﴾ ﴾ طـه، واتە: پەروەردگاری ئێوە کێیە ئەی مووسا؟ مووسا دەفەرموێ: ﴿ رَبُّنَا ٱلَّذِىٓ أَعْطَىٰ كُلَّ شَىْءٍ خَلْقَهُۥ ثُمَّ هَدَىٰ ﴿٥٠﴾ ﴾ طـه، واتە: پەروەردگارمان ئەو

كەسەیە بوونی بە هەموو شتێك بەخشیوە، {هیچ شتێك نەبووە، تاكو خوا بوونی پێ بەخشیوە}، پاشان ڕێنماییشی كردوە، ڕێنمایی كردوە چۆن بەڕێوەبچێت، بۆ نموونە: خۆر نەبووە، خوا پەیدای كردوەو سیستەمێكیشی بۆ داناوە پێی بەڕێوەبچێ، مانگ هەروا لە گەردیلەوە تاكو كەهكەشان، لە خانەوە هەتا ئینسان، هەمووی خوا بوونی پێ بەخشیوە، وە سیستەمێكیشی بۆداناوە پێی بەڕێوەبچێ، ئەوە مانای یەكەمی هیدایەت: ڕێنمایی خوا بەگشتی بۆ دروستكراوەكان.

دووەم: واتای دووەمی هیدایەت تایبەتترە لە یەكەم كە بریتیە لە ڕێنمایی تایبەتی خوا بۆ ئینسان‌و بۆ جن، كە بە پێغەمبەراندا ناردوویەتی، وەك خوا دەربارەی قورئان فەرموویەتی: ﴿ شَهۡرُ رَمَضَانَ ٱلَّذِيٓ أُنزِلَ فِيهِ ٱلۡقُرۡءَانُ هُدٗى لِّلنَّاسِ... ﴿١٨٥﴾ ﴾ البقرة، واتە: مانگی ڕەمەزان كە قورئانی تێدا نێرراوەتە خوار ڕێنماییە بۆ خەڵك ... واتە: ڕێیان پێشان دەدات.

سێیەم: واتای سێیەمی هیدایەت بریتیە لە تەوفیق‌و یارمەتیدانی خوا بۆ ئەوانەی كە بەدەم بانگی خواوە دێن‌و شەریعەتی خوا قەبووڵ دەكەن، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ وَٱلَّذِينَ ٱهۡتَدَوۡاْ زَادَهُمۡ هُدٗى وَءَاتَىٰهُمۡ تَقۡوَىٰهُمۡ ﴿١٧﴾ ﴾محمد، واتە: وە ئەوانەی كە ڕێی ڕاستیان گرتوە خوا هیدایەتیان بۆ زیاد دەكات‌و تەقوایان پێ دەدات، یان دەفەرموێ: ﴿ وَٱلَّذِينَ جَٰهَدُواْ فِينَا لَنَهۡدِيَنَّهُمۡ سُبُلَنَاۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَمَعَ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴿٦٩﴾ ﴾العنكبوت، واتە: ئەوانەی لەڕێی ئێمەدا تێدەكۆشن، ڕێیەكانی خۆمانیان پێشان دەدەین‌و سەرڕاستیان دەكەین (چۆن بەندایەتی بۆ ئێمە بكەن)، بێگومان خوا لەگەڵ چاكەكاران دایە. وە خوا دەفەرموێ: ﴿ ذَٰلِكَ ٱلۡكِتَٰبُ لَا رَيۡبَۛ فِيهِۛ هُدٗى لِّلۡمُتَّقِينَ ﴿٢﴾ ﴾ البقرة، واتە: ئەو كتێبە گومانی تێدانیە، ڕێنماییە بۆ پارێزكاران (ئەوانەی كە خۆ دەپارێزن، بەهۆی شوێنكەوتنی قورئان‌و زیاتر تێگەیشتن لە قورئانەوە بەرچاویان زیاتر ڕۆشن بێتەوە).

(يَتْلُونَهُۥ): (تلاه: تَبِعَهُ متابعة لَيس بَيْنَهَا مَالَيْسَ مِنهَا: ﴿ وَٱلْقَمَرِ إِذَا تَلَىٰهَا ﴿٢﴾ ﴾ الشمس، والتلاوَة تَخْتَصُ باتِبّاع كتب الله المنزَلَة، تَارَةً بالقِرَاءَة، وتَارَةً بالإرتِسَام لَمَا فِيهَا مِنْ أمْرٍ وَنَهي، وَتَرغيب وتَرْهيب، وهُوَ أخَصّ مِن القِراءَة فَكُلُّ تِلاَوَة قِرَاءَة وَلَيْسَ كُلُّ قِراءَة تِلاَوَة)، واتە: وشەی (تَلا) لە زمانی عەرەبیدا وە لە قورئاندا، بە دوو واتا هاتوە: بەمانای شوێنی کەوتن، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ وَٱلْقَمَرِ إِذَا تَلَىٰهَا ﴿٢﴾ ﴾ الشمس، واتە: وە سوێند بە مانگ کە بەدوای خۆردا دێ، دوای ئەوەی خۆر ئاوا دەبێ مانگ دێ، وە (تَلا) بەمانای خوێندنەوەو قیرائەتیش دێت، لەبەرئەوەی خوێندنەوەی وشەکان بەدوای یەکدا دێت‌و، ئەویش بەدوای یەکدا هاتنی تێدایە کەواتە: ﴿ يَتْلُونَهُۥ حَقَّ تِلَاوَتِهِۦٓ ﴾، یانی: وەك پێویست دەیخوێننەوە، یان وەك پێویست شوێنی دەکەون.

(عَدْلٌ): لێرەدا بەمانای قەرەبوو دێ، وەك خوا لە قورئاندا فەرموویەتی: ﴿ أَوْ عَدْلُ ذَٰلِكَ صِيَامًا ...﴿٩٥﴾ ﴾ المائدة، واتە: بەرانبەری ئەوە با بەقەدەر ئەوە بەڕۆژووبێ، کەفارەتی کەسێك کە ئیحرام دەشکێنێ، ئەگەر ئاژەڵێکی دەست نەکەوت، یاخود بارتەقای وی خواردنی نەبوو، با لەجیاتی ئەوە هێندەی خواردنەکە بەڕۆژوو بێت.

## مانای گشتی ئایەتەکان

خوا ﷻ بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: {وە لە دوای پێغەمبەریش بە هەموو مسوڵمانێك دەفەرموێ، چونکە وەك توێژەرەوانی قورئان‌و زانایانی (أصول الفقه) دەڵێن: هەموو ئەو ئایەتانەی کە پێغەمبەرانی خوایان (عليهم الصلاة والسلام) پێ دوێنراون ئوممەتەکەشیانیان پێ دوێنراون، مەگەر بەبەڵگەیەك تایبەت کرابن بە پێغەمبەری خواوە ﷺ ئەگەرنا هەموو ئەو ئایەتانەی کە دواندنیان تێدایە لە خواوە بۆ پێغەمبەر ﷺ، ئوممەتەکەشی دەدوێنن، بەبێ جیاوازیی}

﴿ وَلَن تَرْضَىٰ عَنكَ ٱلْيَهُودُ وَلَا ٱلنَّصَٰرَىٰ حَتَّىٰ تَتَّبِعَ مِلَّتَهُمْ ﴾، جوولەكەو نەصرانیی یەكان لێت ڕازی نابن، تا بەدوای دینو ڕێبازەكەیان نەكەوی، واتە: بەهیچ شتێ لێت ڕازی نابن، هەرچەندە تۆ موداراییان لەگەڵدا بكەی‌و چاكەیان لەگەڵدا بكەی، تەنیا وەختێ لێت ڕازی دەبن‌و وەختێ تۆ بەپەسند دەزانن، كە بەدوای ڕێبازو دینی ئەوان بكەوی ﴿ قُلْ إِنَّ هُدَى ٱللَّهِ هُوَ ٱلْهُدَىٰ ﴾، بەڵام تۆ پێیان بڵێ: بەس ڕێنمایی خوا ڕێنمایی یە، ئنجا ئایا ڕێنمایی خوا لە چیدا بەرجەستە دەبێت؟ بێگومان لە دوای هاتنی پێغەمبەری كۆتایی ﷺ، لەو قورئانەدا كە بۆی ناردوەو لەو ڕێبازو شێوازەدا كە پێغەمبەری كۆتایی ﷺ قورئانی پێ جێبەجێكردوە، كە پێی دەگوترێ سوننەت، بەرجەستەیە، ﴿ وَلَئِنِ ٱتَّبَعْتَ أَهْوَآءَهُم بَعْدَ ٱلَّذِى جَآءَكَ مِنَ ٱلْعِلْمِ ﴾، وە ئەگەر تۆ بەدوای ئارەزوویان بكەوی، دوای ئەوەی زانیارییت بۆ هاتوە (كەواتە: قورئان زانیاری خوایە) ﴿ مَا لَكَ مِنَ ٱللَّهِ مِن وَلِىٍّ وَلَا نَصِيرٍ ﴾، ئەوە جگە لە خوا هیچ سەرپەرشتیارو هیچ دۆستێكت نیە، وە هیچ یاریدەدەرێكتان نابێت.

دەڵێن لە (ئیمام ئەحمەد)یان پرسیوە: بەڵگەت چییە لەسەر ئەوە كە كەسێك بڵێ: قورئان دروستكراوە، كافر دەبێت؟ گوتوویەتی: ئەم ئایەتە كە دەفەرموێ: ﴿ بَعْدَ ٱلَّذِى جَآءَكَ مِنَ ٱلْعِلْمِ ﴾، (دوای ئەو زانیارییەی كە بۆت هاتوە) دەڵێ: كەواتە قورئان زانیاری خوایەو، (عیلم)یش سیفەتی خوایەو سیفەتی خواش نابێ دروستكراوبێ، هەروەها خوا كە دەفەرموێ: ﴿ ...فَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّمَآ أُنزِلَ بِعِلْمِ ٱللَّهِ ...﴿١٤﴾ ﴾ هود، بزانن كە قورئان بەزانیاری خوا نێرراوەتە خوار.. ئنجا دەفەرموێ: ﴿ ٱلَّذِينَ ءَاتَيْنَٰهُمُ ٱلْكِتَٰبَ يَتْلُونَهُۥ حَقَّ تِلَاوَتِهِۦٓ ﴾، دوای ئەوەی باسی جوولەكەو نەصرانیی یە خراپەكان دەكات، دێتە سەر باسی ئەوانەیان كە هیدایەتیان دەدرێت‌و هیدایەت وەردەگرن، دەفەرموێ: ئەوانەی كە كتێبمان پێداون وەك شایستەیە دەیخوێننەوە، یان وەك ئەوەی شایستەیە شوێنی دەكەون ﴿ أُو۟لَٰٓئِكَ يُؤْمِنُونَ بِهِۦ ﴾، ئا ئەوانە

بەڕاستی ئیمانیان بەکتێبی خوا هەیە، یاخود ئەوانەی بەڕاستی ئیمان بە کتێبی خوا دێنن، هەموو ئەوانەن کە لەگەڵ تەوڕات‌و ئینجیلی پێشوودا ڕاست دەکەن‌و، ئەگەر لەگەڵ تەوڕات‌و ئینجیلدا ڕاست بکەن‌و چاك شوێنیان بکەون، ئیمان بە پێغەمبەری کۆتایی ﷺ دێنن، بۆچی؟ چونکە نیشانەکانی پێغەمبەری کۆتایی ﷺ وە موژدەدان بەهاتنی پێغەمبەری کۆتایی ﷺ، لە تەوڕات‌و ئینجیلدا هەیە ﴿ وَمَن يَكْفُرْ بِهِۦ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْخَٰسِرُونَ ﴾، وە هەر کەسێك بێبڕوا بێ بە پێغەمبەری کۆتایی ﷺ یاخود بە کتێبی خوا، ئا ئەوانە زیان بارانن.

ئنجا لە کۆتایی ئەو ئایەتانەدا کە هەموویان باسی جوولەکەکان بەتایبەت‌و خاوەن کتێبەکان بەگشتی دەکەن، دەفەرموێ: ﴿ يَٰبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ٱذْكُرُوا۟ نِعْمَتِىَ ٱلَّتِىٓ أَنْعَمْتُ عَلَيْكُمْ ﴾، ئەی وەچەی ئیسرائیل! (ئەی نەوەی یەعقووب) چاکەی من بەسەر خۆتانەوە ببینن، یادی بکەنەوەو لەبیرتان نەچێ ﴿ وَأَنِّى فَضَّلْتُكُمْ عَلَى ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾، وە کە من بەسەر جیهانییاندا پەسندم کردوون‌و هەڵمبژاردوون، دیارە ئەو جوولەکانەی ئێستا، یاخود ڕۆژگاری پێغەمبەر ﷺ مەبەست نین، بەڵکو مەبەست پێی باب‌و باپیرانیانە، کە لە ڕۆژگاری خۆیدا هیچ کەس لەوان (جوولەکەکان) باشتر نەبوو، چونکە ئەوکاتە هەر ئەوان بە دوای پێغەمبەری خوا کەوتوون کە مووسایە، وە هەر ئەوان بوون کە شایستەیی ئەوەیان هەبێت لەگەڵ کەم‌و کوورییەکانیشدا، کە کتێبی خوا هەڵبگرن، وە بەرنامەی خوا لە ژیانی خۆیاندا پیادە بکەن، بۆیە ئەوکاتە لە هەموو خەڵکی سەردەمی خۆیان باشتر بوون، بەڵام نەك لە خەڵکی ئێستا باشتر بن، چونکە خوا لە سوورەتی (البَيِّنَة)دا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ وَٱلْمُشْرِكِينَ فِى نَارِ جَهَنَّمَ خَٰلِدِينَ فِيهَآ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ هُمْ شَرُّ ٱلْبَرِيَّةِ ﴿٦﴾ ﴾، واتە: بێگومان ئەوانەی کە بێبڕوان لە خاوەن کتێبەکان‌و لە هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان، ئەوانە لە ئاگری دۆزەخدا هەمیشەیین‌و ئەوانە خراپترین دروستکراوی خوان، یان دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ شَرَّ

ٱلدَّوَآبِّ عِندَ ٱللَّهِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فَهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿٥٥﴾ ﴾ الأنفال، واتە: خراپترین زیندەوەر لەلای خوا ئەوانەن کە بێبڕوان، چونکە ئیمان ناهێنن، جا دەفەرموێ: ﴿ وَٱتَّقُواْ يَوْمًا لَّا تَجْزِي نَفْسٌ عَن نَّفْسٍ شَيْـًٔا ﴾، وە لە ڕۆژێك خۆتان بپارێزن، (واتە: لە سزای ڕۆژێك خۆتان بپارێزن) کە هیچ کەس دەفریای کەس نایێ ﴿ وَلَا يُقْبَلُ مِنْهَا عَدْلٌ ﴾، وە هیچ کەسێك بەلاگێڕەوەو قەرەبووی لێ وەرناگیرێ ﴿ وَلَا تَنفَعُهَا شَفَٰعَةٌ ﴾، وە هیچ کەسێك تکاو ڕەجای هیچ کەسێك سوودی پێ ناگەیەنێ ﴿ وَلَا هُمْ يُنصَرُونَ ﴾، وە هیچ کام لەوانەش سەرناخرێن‌و یارمەتی نادرێن، کەواتە چار هەر ئەوەیە کە ئیمان بە پێغەمبەری کۆتایی بێنن‌و، بەدوای دوایین نوسخەی هیدایەتی خوا بکەون کە قورئانی بەرزو بەڕێزە.

## چەند مەسەلەیەکی گرنگ

**مەسەلەی یەکەم:** ئەوە کە دەفەرموێ: ﴿ وَلَن تَرْضَىٰ عَنكَ ٱلْيَهُودُ وَلَا ٱلنَّصَٰرَىٰ حَتَّىٰ تَتَّبِعَ مِلَّتَهُمْ ﴾، جوولەکەو نەصرانیی یەکان لێت ڕازی نابن تا بە دوای دینەکەیان نەکەوی، ئەوە حەقیقەتێکە خوا بە پێغەمبەری ﷺ ڕاگەیاندوە، وە بە ئۆممەتەکەیشی‌و بە ئێمەشی ڕاگەیاندوە، کە ئێمە دەست بشۆین لەوە کە جوولەکەو نەصرانییان لە خۆمان ڕازی بکەین، لێمان ڕازی نابن! دیارە ئەو جوولەکەو نەصرانییانەی کە مسوڵمان دەبن جوولەکەو نەصرانیی نامێنن، بۆیە لە خواش ڕازین‌و لە ئیسلامیش ڕازین‌و لە مسوڵمانانیش ڕازین، بەلام ئەوەی کە بە جوولەکەیی‌و بە نەصرانیی دەمێنێتەوە، ئەوە موستەحیلە لە مسوڵمانان ڕازی بن، مەگەر کاتێ کە مسوڵمانان بەدوایان بکەون، جا ئەگەر مسوڵمانان ماستاویان بۆ کردن‌و بەدوایان کەوتن‌و وەك ئەوانیان کرد، ئەو کاتە لێیان ڕازی دەبن‌و پەسندیان دەکەن، ئێستاش وایەو هەرکەسێك بە دەهۆڵی ئەمەریکاو بە دەهۆڵی جوولەکەو ئیسرائیل هەڵپەڕێ، ئەوە دەڵێن:

زۆر پیاوی باشە جا حوکمەت‌و دەوڵەت بێ، حیزب بێ، شەخص بێ، لێی ڕازین‌و دەڵێن تۆ ئینسانی باشی، بەڵام هەرکەسێك دژی سیاسەتی ئەوان بێت‌و دژی بیروبۆچوونەکانی ئەوان بێ‌و دژی کوفرو زوڵمی ئەوان بێ، ئەوە تیرۆریست‌و خراپەکارەو گێرە شێوێنەو مافی ژیان‌و مافی مانەوەی نیە !

**مەسەلەی دووەم:** خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ قُلْ إِنَّ هُدَى ٱللَّهِ هُوَ ٱلْهُدَىٰ ﴾، بڵێ: تەنیا ڕێنمایی خوا ڕێنمایی یە، (واتە: تەنیا بەرنامەی خوا بەرنامەیە، لەوبارەوە خوای بەرزو مەزن لە سوورەتی (الأنعام)دا دەفەرموێ: ﴿ وَأَنَّ هَٰذَا صِرَٰطِي مُسْتَقِيمًا فَٱتَّبِعُوهُ ۖ وَلَا تَتَّبِعُوا۟ ٱلسُّبُلَ فَتَفَرَّقَ بِكُمْ عَن سَبِيلِهِۦ ۚ ذَٰلِكُمْ وَصَّىٰكُم بِهِۦ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ﴿١٥٣﴾ ﴾ الأنعام، واتە: ئەمە ڕاستە شەقامی منە (واتە: ئیسلام) شوێنی بکەون‌و بەدوای ڕێچکەکان مەکەون، ئەگەرنا لە ڕاستەشەقامی خوا پەرتەوازە دەبن ﴿ ذَٰلِكُمْ وَصَّىٰكُم بِهِۦ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ﴾، خوا ئەم ئامۆژگارییەی ئێوەی کردوە، بۆ ئەوەی تەقواتان پێ پەیدا بێت‌و بۆ ئەوەی پارێز لە خوا بکەن، کەواتە کێ ئەهلی تەقوایە؟ کەسێك کە تەنیا ڕێی ئیسلام دەگرێ، وە لە ڕێی ئیسلام لا نادات، بەڵام کەسێك لە ڕێی ئیسلام لادەداو بەدوای کوێرە ڕێیان دەکەوێ‌و بە دوای ڕێچکەو بیردۆزە شەیتانییەکان دەکەوێ، ئەگەر سەریشی بە بەرماڵێیەوە بچێ، ئەگەر خاوەنی تەکیەو خانەقابێ، ئەگەر مزگەوت دروست بکات، ئەگەر هەرچی بکات... ئایا دەتوانێ بڵێ: من ئەهلی تەقوام؟ نەخێر، چونکە خوا ﷻ دەفەرموێ: بەدوای ڕاستەشەقامی من بکەون‌و بەدوای ڕێچکەکان مەکەون، پاشان دەفەرموێ بۆیەش ئەم ئامۆژگارییەم کردوون تاکو تەقواتان پەیدابێت ! کەواتە: کەسێك پارێزکارو موتتەقی‌و ئەهلی خوایە، کە تەنیا بەدوای دینی خوا بکەوێ‌و، کەسێك کە بەدوای ڕێچکەکان بیردۆزەکان دەکەوێ‌و بەدوای غەیری قورئان‌و سوننەت دەکەوێ، ئەوە لەڕاستیدا هەر ناوونیشانێکی هەبێت وە هەر دیمەن‌و ڕەنگ‌و ڕواڵەتێکی هەبێت، بە ئەهلی تەقوا لەقەڵەم نادرێ، بەڵکو هەر بە مسوڵمانیش لەقەڵەم نادرێ، چونکە

مسولمان ئەو کەسەیە تەنیا بەدوای ڕێی خوا بکەوێو، تەنیا بۆ خوا گەردنکەچ بێت، لەوبارەوەش ئەم فەرموودەیە هەیە: {عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ رضي الله عنه قَالَ: خَطَّ لَنَا رَسولُ اللهِ ﷺ خَطّاً ثُمَّ قَالَ: (هَذَا سَبِيلُ اللهِ) ثُمَّ خَطَّ خُطُوطاً عَنْ يَمِينِهِ وعَنْ شِمَالِهِ، ثُمَّ قَالَ: (هَذِهِ سُبُلٌ مُتَفَرِّقَةٌ عَلَى كُلِّ سَبِيلٍ مِنْهَا شَيْطَانٌ يَدْعُو إِلَيهِ وَقَرَأَ: ﴿وَأَنَّ هَٰذَا صِرَاطِي مُسْتَقِيمًا فَاتَّبِعُوهُ ...﴿١٥٣﴾﴾ الأنعام) (أَخْرَجَهُ أَحْمَد بِرقم: (٤٤٣٧)، وَالطَّيَالِسي بِرقم: (٢٤٤)، وَالنَّسَائِيُّ فِي (الكبرى) بِرقم: (١١١٧٤)، والدَّارَمِي بِرقم: (٢٠٦)، وَالطَّبَرِي فِي (التفسير) بِرقم: (١٤١٦٨)، وَصَحَّحَهُ الحَاكِمُ فِي (المستدرك) بِرقم: (٣٢٤١)، ووافقهُ الذهبي، وَصَحَّحَهُ أَحْمَد شَاكِر} کە ئەمە جۆرێکە لە تەفسیرکردنی پێغەمبەرﷺ بۆ قورئان. واتە: عەبدوڵلای کوڕی مەسعوود دەڵێ: لە خزمەت پێغەمبەر ﷺ دانیشتبووین، هێڵێکی بۆ کێشاین بە — دارووچکەیەك، یان بە پەنجەی موبارەکی لەسەر گڵ - وە فەرمووی: ئەوە ڕێبازی خوایە، وە دوایی هەندێ هێڵی خوارو خێچی لەلای ڕاستو چەپی هێڵە ڕاستەکە کێشانو ئاماژەی بۆ وردە هێلەکان کردو فەرمووی: ئەوەش ڕێچکەکانەو لەسەر هەر ڕێچکەیەك شەیتانێك هەیە، خەڵکی بۆ بانگ دەکا (مارکسیزم، کۆمۆنیزم، ماویزم، کە زیاتر کاتی خۆی هەبوون، کاپیتالیزم، لیبراڵیزم، سیکۆلاریزم ناسیۆنالیزم، ئەوانە گشتیان ڕێچکەن)، وە لەسەر هەرکام لەو ڕێچکانە شەیتانێك هەیە، (بەڵکو شەیتانەکان هەن)، کە خەڵکیان بۆ بانگ دەکەن، ئنجا ئەم ئایەتەی خوێندەوە: وە ئەمە ڕاستەشەقامی منە، دەجا شوێنی بکەونو مەکەونە شوێن ڕێچکەکان، هەڵبەتە سەرەنجامیش دیارەو کە هەرکەسێك بەدوای ڕێی شەیتان بکەوێ، بە تەئکید لەگەڵ شەیتان لە دۆزەخدا کۆدەبێتەوە، وە هەرکەسێك بە دوای پێغەمبەر بکەوێ ﷺ، بەدڵنیایی ئەوەی لە دنیادا لە خزمەت ڕێو شوێنی ئەودابێ، لە دواڕۆژیشدا لە خزمەت ئەودا دەبێت لە بەهەشتی خوادا. خوا لەو کەسانەمان بگێڕێ کە لەدنیادا لە خزمەتی ڕێبازی پێغەمبەردا دەبن ﷺ وە لە دواڕۆژیشدا لە بەهەشتی ڕازاوەو نەبڕاوەی خوادا دەبن، ئنجا دەربارەی

ئەوە کە لە جوولەکەو نەصرانییان قەبوول ناکرێ، کە بێجگە لە ئیسلام بە دوای هیچ شتێکی دیکە بکەون‌و، جگە لە موحەممەد ﷺ بەدوای هیچ پێغەمبەرێکی دی بکەون، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {(وَالذي نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ، لاَ يَسْمَعُ بِي أَحَدٌ مِنْ هَذِهِ الأُمَّةِ يَهُودِيٌ وَلاَ نَصْرَانِيٌ، ثُمَّ يَمُوتُ وَلَمْ يُؤْمِنْ بِالَّذِي أُرسِلْتُ بِهِ، إلاَّ كَانَ مِن أَصحابِ النَّارِ) (رَوَاهُ مُسْلِم برقم: (٣٨٤)، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه} واتە: سوێند بەو کەسەی کە گیانی موحەممەدی بەدەستە (سوێندی پێغەمبەر ﷺ بە زۆری ئاوا بووە) گوێبیستی من نابێ لەم ئوممەتە، هیچ کەسێکی جوولەکەو هیچ کەسێکی نەصرانیی، پاشان ئیمان بەوە نەهێنێ کە پێمدا ڕەوانەکراوە، ئەوە مسۆگەر دەچێتە دۆزەخ‌و هاوەڵی دۆزەخە.

لەم فەرموودەیە وەردەگیرێ، کە وشەی (الأُمَّةِ) دوو چەمك‌و واتای هەیە، بۆیە ئەوانەی کە ئیماندارن پێیان دەگوترێ ئوممەتی موحەممەد ﷺ، وە بەشەرییەتیش هەر پێی دەگوترێ: ئوممەتی موحەممەد ﷺ، ئەدی جیاوازییان چییە؟ جیاوازییان ئەوەیە کە ئەوانەی ئیمانیان بە موحەممەد ﷺ هێناوە، پێیان دەگوترێ: (ئوممەتی وەڵامدەرەوە) (الأُمَّة المُستجيبة)، چونکە ئێمە وەڵامان داوەتەوەو گوتوومانە: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ لە خزمەتت داین‌و بە دوات دەکەوین‌و لە خزمەت ڕێبازەکەت داین، بەڵام ئەوانی دیکە (ئوممەتی بانگکراون) (الأُمَّة المدعوَّة)ن، چونکە پێغەمبەر ﷺ بانگی کردوون، بەڵام جوابیان نەداوەتەوە، ئەگەرنا ئەوانیش هەر لەسەر میلاکی پێغەمبەرن ﷺ، چونکە ئەگەر هەزار (١٠٠٠) ساڵ بە دوای مووساو عیساو ئیبراهیم‌و بەدوای زەردەشت بەدوای هەرکەسێك بکەون کە بە پێغەمبەری دەزانن، ئایا لای خوا پێغەمبەر بووبێ، یان پێغەمبەر نەبووبێ، مادام بەدوای موحەممەد ﷺ نەکەون، بایی فلسێك ناکا ! ئەوە پێغەمبەر وا دەفەرموێ، وە خواش ﷻ لە سوورەتی (الأعراف)دا دەفەرموێ: ﴿ قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنِّى رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيْكُمْ جَمِيعًا ...﴿١٥٨﴾ ﴾، واتە: بڵێ: ئەی خەڵکینە! من پێغەمبەری خوام، ڕەوانەکراوی خوام بۆ هەمووتان بەبێ هەڵاواردن،

واتە: هەمووتان دەبێ بەدوام بکەون، چونکە لە دوای هاتنی موحەممەد ﷺ هەموو ئەو بەرنامانەی کە بۆ کۆمەڵگایەکی دیاریکراوو لە قۆناغێکی دیاریکراودا هاتوون، نەماون‌و ئەگەر مابیشن گۆڕاون‌و دەستکاریی کراون، وە ئەگەر گریمان نەشگۆڕرابن، چونکە بۆ قۆناغ‌و کۆمەڵگایەکی تایبەت‌و دیاریکراو نێرراون، ئاسایی یە کە بۆ کۆمەڵگاو قۆناغێکی دیکەی نەشێن، کە بۆ چارەسەری کێشەو گرفتەکانی وان نەنێرراون، بەڵام تاکە بەرنامەیەك کە بۆ هەموو بەشەر هاتوە، بەدرێژایی زەمان بە پانیی زەمین، ئەو شەریعەتەیە کە بۆ پێغەمبەری کۆتایی هاتوە، کە لە ئیسلامدا بەرجەستەیە.

**مەسەلەی سێیەم:** کە خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ وَلَئِنِ اتَّبَعْتَ أَهْوَاءَهُم بَعْدَ الَّذِي جَاءَكَ مِنَ الْعِلْمِ ﴾، ئەگەر تۆ بەدوای ئارەزووی وان بکەوی، پاش ئەو زانیارییەی کە بۆت هاتوە .﴿ مَا لَكَ مِنَ اللَّهِ مِن وَلِيٍّ وَلَا نَصِيرٍ ﴾، لە لایەن خواوە هیچ دۆست‌و هیچ پشتیوانێك‌و یارمەتی دەرێکت بۆ نابێ، لێرەدا مەبەست ئەوە نیە ئەگەری ئەوە بووبێ کە پێغەمبەر ﷺ بەدوای جوولەکەو نەصرانی یەکان بکەوێ، بەڵکو لەڕاستیدا مەبەست ئەوەیە کە ئێمە تێبگەین کە قەزییەکە زۆر جیددییەو، شوێن پێ هەڵگرتنی پێغەمبەری خاتەم ﷺ، وە وریا بوون لە ترازان‌و لادان لە ڕاستەشەقامی پێغەمبەر ﷺ، زۆر جیددییەو تەنانەت لە پێغەمبەری خواش ﷺ قەبووڵ نەکراوەو ئاوا بە توندی پێی گوتراوە، ئەگەرنا لەبەر ئەوە نیە کە پێغەمبەر ﷺ بگونجێ لابدا، وەك لە شوێنی دیکەش خوا پێی دەفەرموێ: ﴿ ...لَئِنْ أَشْرَكْتَ لَيَحْبَطَنَّ عَمَلُكَ ... ﴿٦٥﴾ ﴾ الزمر، واتە: ئەگەر هاوبەش بۆ خوا دانێی کردەوەکەت هەڵدەوەشێتەوە، خۆ خوا زانیویەتی کە شیرك بۆ خوا پەیدا ناکات، بەڵام بۆ ئەوەی خەڵکی دیکەی پێ بترسێنێ‌و بزانن مەسەلەکە زۆر جیددییە، ئەو شێوازەی بەکارهێناوە.

**مەسەلەی چوارەم:** کە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ ٱلَّذِينَ ءَاتَيۡنَٰهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ يَتۡلُونَهُۥ حَقَّ تِلَاوَتِهِۦٓ ﴾، چ مەبەست لە (يَتۡلُونَهُۥ) شوێن کەوتنی کتێبی خوا بێ، چ خوێندنەوەی بێت، کەسانێك بەڕاستی بە ئیماندار لەقەڵەم دەدرێن، وە بە ئیماندار بە کتێبی خواو ئیماندار بە پێغەمبەری خوا ﷺ دادەنرێن، کە وەك پێویست بە شوێن کتێبی خوا بکەون‌و، وەك پێویست پێوەی پابەندبن، چونکە پاش شوێنکەوتنی کتێبی خواو چاك خوێندنەوەی، بەوە دەبێ کە حەڵاڵە بە حەڵاڵەکەی بزانێ‌و حەرامەکەی بە حەرام بزانێ‌و، وەك پێویست پابەندی بێت.

**مەسەلەی پێنجەم:** کە لە کۆتاییدا خوا ﷻ ئەوەی کە لە سەرەتاوە فەرموویەتی: ﴿ يَٰبَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ ٱذۡكُرُواْ نِعۡمَتِيَ ٱلَّتِيٓ أَنۡعَمۡتُ عَلَيۡكُمۡ وَأَنِّي فَضَّلۡتُكُمۡ عَلَى ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴾، لێرەدا دووبارەی کردۆتەوە، لەگەڵ تۆزێك جیاوازییدا، ئەوە لەڕاستیدا بۆ ئەوەیە کە لە سەرەتاو کۆتاییدا خوای پەروەردگار، بەڵگە لەسەر جوولەکەکان‌و ئەهلی کیتاب بەگشتی تەواو بکات، کە مادام خوا ئەو هەمووە چاکەی لەگەڵ کردوون، دەبێت لە بەرانبەر ئەو چاکانەی خوادا سوپاسگوزاربن‌و، شوکرانە بژێربن‌و بۆتان نیە کوفر بە کتێبەکەی بکەن، کە دوایین کتێبە بۆ هەموو بەشەرییەتی ناردوەو بۆتان نیە کوفر بە پێغەمبەرەکەی بکەن، بەڵکو ئەگەر بتانەوێ سوپاسگوزارو شوکرانە بژێربن‌و بتانەوێ بەبێ وەفاو سپڵە لەقەڵەم نەدرێن، پێویستە وەك چۆن ئیمانتان بە مووساو پێغەمبەرایەتییەکەی هێناوە، ئیمان بە پێغەمبەری کۆتاییش بێنن، کە موحەممەدە ﷺ‌و بەو کتێبەو بەو شەریعەتە کۆتاییەشەوە کە خوا ﷻ بۆی ناردوە پابەندبن.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی بیست و شەشەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان لە ئایەتی (١٢٤ تا ١٢٩) لە سوورەتی (البقرة) دەگرێتە خۆی، لەم شەش ئایەتە موبارەکەدا خوا ﷻ باسی ئەوەمان بۆ دەکات، کە چۆن ئیبراهیمی ﷺ کردۆتە پێشەوا بۆ خەڵکی، واتە: پێشڕەوو پێشەوایان بۆ دینداریی‌و بەندایەتیی ڕاستەقینە بۆ خوا، وە پاشان چۆن کەعبەی کردوە بە شوێنی کۆبوونەوەی خەڵك‌و شوێنێکی پڕ هێمنیی‌و ئاسایش، وە دوایی باسی ئەوەمان بۆ دەکات کە چۆن ئیبراهیم‌و ئیسماعیلی کوڕی ڕاسپاردوە کە کەعبە پاك بکەنەوە، بۆ کەسانێك کە طەوافی بەدەوردا دەکەن‌و تێیدا دەچنە ئیعتیکافەوەو سەجدەو ڕکووعی تێدا دەبەن، وە دوایی دووعاو پاڕانەوەی (ئیبراهیم)مان ﷺ بۆ باس دەکات، هەروەها چۆنیەتی دروستکردنی کەعبەمان بۆ باس دەکات لەلایەن ئیبراهیم‌و ئیسماعیلی کوڕییەوە (علیهما الصلاة والسلام).

﴿ وَإِذِ ٱبْتَلَىٰٓ إِبْرَٰهِـۧمَ رَبُّهُۥ بِكَلِمَـٰتٍ فَأَتَمَّهُنَّ ۖ قَالَ إِنِّى جَاعِلُكَ لِلنَّاسِ إِمَامًا ۖ قَالَ وَمِن ذُرِّيَّتِى ۖ قَالَ لَا يَنَالُ عَهْدِى ٱلظَّـٰلِمِينَ ﴿١٢٤﴾ وَإِذْ جَعَلْنَا ٱلْبَيْتَ مَثَابَةً لِّلنَّاسِ وَأَمْنًا وَٱتَّخِذُوا۟ مِن مَّقَامِ إِبْرَٰهِـۧمَ مُصَلًّى ۖ وَعَهِدْنَآ إِلَىٰٓ إِبْرَٰهِـۧمَ وَإِسْمَـٰعِيلَ أَن طَهِّرَا بَيْتِىَ لِلطَّآئِفِينَ وَٱلْعَـٰكِفِينَ وَٱلرُّكَّعِ ٱلسُّجُودِ ﴿١٢٥﴾ وَإِذْ قَالَ إِبْرَٰهِـۧمُ رَبِّ ٱجْعَلْ هَـٰذَا بَلَدًا ءَامِنًا وَٱرْزُقْ أَهْلَهُۥ مِنَ ٱلثَّمَرَٰتِ مَنْ ءَامَنَ مِنْهُم بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْـَٔاخِرِ ۖ قَالَ وَمَن كَفَرَ فَأُمَتِّعُهُۥ قَلِيلًا ثُمَّ أَضْطَرُّهُۥٓ إِلَىٰ عَذَابِ ٱلنَّارِ ۖ وَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ ﴿١٢٦﴾ وَإِذْ يَرْفَعُ إِبْرَٰهِـۧمُ ٱلْقَوَاعِدَ مِنَ ٱلْبَيْتِ وَإِسْمَـٰعِيلُ رَبَّنَا تَقَبَّلْ مِنَّآ ۖ إِنَّكَ أَنتَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴿١٢٧﴾ رَبَّنَا وَٱجْعَلْنَا مُسْلِمَيْنِ لَكَ وَمِن ذُرِّيَّتِنَآ أُمَّةً مُّسْلِمَةً لَّكَ وَأَرِنَا مَنَاسِكَنَا وَتُبْ عَلَيْنَآ ۖ إِنَّكَ

أَنتَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١٢٨﴾ رَبَّنَا وَٱبۡعَثۡ فِيهِمۡ رَسُولٗا مِّنۡهُمۡ يَتۡلُواْ عَلَيۡهِمۡ ءَايَٰتِكَ وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡحِكۡمَةَ وَيُزَكِّيهِمۡۖ إِنَّكَ أَنتَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ﴿١٢٩﴾ ﴾

## مانای وشە بە وشەی ئایەتەكان

((وە یادبكەوە كاتێك پەروەردگاری ئیبراهیم بە چەند ئەركێك تاقی كردەوە، ئەویش بە تەواوی ئەنجامیدان، جا خوا فەرمووی: من دەتكەمە پێشەوا بۆ خەڵكی گوتی: لە وەچەكەیشم؟ فەرمووی: نا ستەمكاران بەڵێنی من نایانگرێتەوە ﴿١٢٤﴾ وە یاد بكەوە كاتێك كە خانووی كەعبەمان كردە مەكۆو مایەی ئاسایش بۆ خەڵكی، وە شوێنی لێوەستانی ئیبراهیم بكەنە نوێژگە، وە بە ئیبراهیم‌و ئیسماعیلمان ڕاگەیاند كە ماڵەكەم پاك بكەنەوە بۆ طەوافكەران‌و خەلۆەكێشان‌و ڕكووعبەران‌و كڕنووشبەران ﴿١٢٥﴾ وە یاد بكەنەوە كاتێ ئیبراهیم گوتی: پەروەردگارم ئەم شوێنە پڕ هێمنیی‌و ئاسایش بكەو لە میوەجات بە خەڵكەكەی بدە، ئەوانەیان كە بڕوا دێنن بە خواو بە ڕۆژی دوایی، (خوا) فەرمووی: ئەوەش كە بێبڕوایە، كەمێك پێی دەگوزەرێنم، پاشان پەلكێشی دەكەم بەرەو ئازاری ئاگر كە خراپترین سەرەنجامە ﴿١٢٦﴾ وە یاد بكەنەوە كاتێ ئیبراهیم‌و ئیسماعیل بناغەی ماڵی خوایان بەرز دەكردەوە (دەیانگوت:) پەروەردگارمان لێمان وەربگرە بێگومان هەر تۆی بیسەری زانا ﴿١٢٧﴾ پەروەردگارمان وە بمانكە ملكەچی خۆت‌و لە وەچەكەشمان كۆمەڵێكی گەردنكەچ بۆخۆت بڕەخسێنە، وە خوا پەرستییەكانمان پێشان بدەو لێمان خۆشبە، بێگومان هەرتۆی تۆبە وەرگری بە بەزەیی ﴿١٢٨﴾ وە پەروەردگارمان پێغەمبەرێكیان تێدا بنێرە كە ئایەتەكانی تۆیان بەسەردا دەخوێنێتەوەو كتێب‌و حیكمەتیان فێردەكات، پاك‌و چاكیان دەكات بێگومان هەر تۆی زاڵی كاربەجێ ﴿١٢٩﴾)).

## شیکردنەوەی هەندێك لە وشەكان

**(وَإِذِ)**: لە دەرسەكانی ڕابردووشدا باسمان كرد، كە خوا لێرە دەفەرموێ: (وَإِذِ ٱبْتَلَىٰٓ) لە چەند شوێنێكدا، وشەی (إِذْ) (مَنْصُوب)ە، بەپێی ئەوە كە بە كات دادەنرێت، واتە: كاتێك كە شتێكی تێدا ئەنجام دراوە، وەك: (اذْكر) یادبكەوە.

**(وَإِذِ ٱبْتَلَىٰٓ)**: واتە: تاقیكردەوە، بەڵام ئەسڵی (ابتَلَی: بَلِيَ الثَّوبُ بِلىً وَبِلاءً، أي: خَلِقَ)، واتە: بەرگەكە شڕبوو (خَلِقَ): شڕبوو، كۆن بوو. وە دەگوترێ: (وبلَوتُهُ: اختَبرتُهُ كأني أخلَقْتُهُ مِن كثرة اختباري لَهُ)، واتە: تاقیم كردەوە، وەك ئەوەی كە تۆ ئەو شتەت كۆن كردبێت، هێندەی تاقیبكەیەوە بیجەڕبێنی.

**(بِكَلِمَٰتٍ)**: واتە: وشەكان كە كۆی (كَلِمَة)یە، كە لێرەدا بەمجۆرە تەفسیركراوە: (هِيَ الأشْيَاءُ التي امْتَحَنَ اللهُ بها إبْرَاهِيمَ)، واتە: ئەوشتانەی كە خوا ئیبراهیمی پێ تاقیكردوونەوە، كە كۆمەڵێك فەرمانی پێكردوونو كۆمەڵێك ئەركی پێ سپاردوون.

**(فَأَتَمَّهُنَّ)**: واتە: تەواوی كردن، هەموو ئەركەكان كە خوا ئیبراهیمی پێ تاقیكردنەوە، بەتەواوی جێبەجێی كردوون بەتەواوی، دەڵێ: (تَمَامُ الشَّيءِ: انتهَاؤهُ إلى حَدّ لا يحتَاج إلى شَيء خارِجٍ عَنهُ) كە دەگوترێ ئەوشتە تەواو بووە، واتە: گەیشۆتە ڕاددەیەك كە پێویستی بەهیچ شتێكی دەرەوەی خۆی نیە.

**(إِمَامًا)**: واتە: پێشەوا، كەسێك كە سەرمەشقو پێشەنگی خەڵكە. دەگوترێ (أَمَّ، يَؤُمُّ، إمَاماً، والإمَامُ: المُؤتَمُّ بِهِ، إنسَاناً كانَ يُقْتَدَى بقَولِهِ، أو فعلِهِ، أو كِتاباً أو غَيرَ ذلكَ، مُحِقاً أو مُبطِلاً، وَجَمعُهُ أئِمَة)، (إمام) یانی: كەسێك

کە دەکرێتە پێشڕەوو پێشەوا، جا ئینسان بێ، ئیقتیدای پێبکرێ، بە قسەی، یان بە کردەوەی، یان کتێب بێت، یان هەرشتێك بێ، وە چ لەسەر هەق بێ، چ لەسەر باطڵ بێت، وە کۆیەکەی (أئِمَّة)یە، وە خوا ﷻ وشەی (أئِمَّة)ی لە قورئاندا هەم بۆ کەسانێك بەکارهێناوە، کە دەبن بە پێشڕەوو چاوساغی خەڵکی لە هەقدا، وەك پێغەمبەران (عليهم الصلاة وسلام) یاخود لە ناهەقیدا، وەك فیرعەون و طاغووتەکان، وەك دەفەرموێ: ﴿وَجَعَلْنَاهُمْ أَئِمَّةً يَدْعُونَ إِلَى النَّارِ وَيَوْمَ الْقِيَامَةِ لَا يُنصَرُونَ ... ﴿٤١﴾﴾القصص، واتە: کردمانن بە پێشەوا، واتە فیرعەون و دارو دەستەکەیمان کردنە کۆمەڵە پێشەوایەك و سەرمەشقێك کە خەڵك بەرەو ئاگر ڕێنمایی دەکەن.

(ذُرِّيَّتِي): واتە: لە وەچەکەی من، ئەوانەی کە لەمن پەیدا دەبن، ئیبراهیم بۆ ئەوانیش داوای کردوە، ئایا خوا لەوانیشدا پێشەوایان دیاری دەکا؟ (الذُّرِّيَّةُ: النَّسْل) یانی: وەچە.

(عَهْدِي): (العَهْدُ: حِفْظُ الشَّيءِ وَمُرَاعَاتُهُ حَالاً بَعْدَ حَالٍ، وَسُمِّيَ المَوْثِقُ وَمُرَاعَاتُهُ عَهْداً). (العَهْدُ) لە ئەسڵدا واتە: پارێزگاریی کردنی شتێك و چاودێرییکردنی حاڵ لە دوای حاڵ، وە بۆیە بەڵێن و پەیمان ناوی لێنراوە (عَهْد)، چونکە ئەو کەسەی بەڵێن و پەیمانێ دەدا، ئاگای لێ دەبێ دەیپارێزێ. (عَهِدَ إليهِ)، واتە: بەڵێنی پێدا، یاخود ڕایسپارد، یاخود فەرمانی پێکرد، بە هەر سێ واتاکان هاتوە.

(الْبَيْتَ): واتە: ماڵ، خانوو. (أصْلُ البَيْتِ: مَأوَى الإنسَانِ باللَّيلِ) ئەو شوێنەی کە ئینسان شەو تێیدا سەقامگیر دەبێت و تێیدا پشوو دەدات. چونکە لە زمانی عەرەبیدا (بَاتَ) واتە: شەوی کردەوە (بَاتَ يَبِيت) واتە: شەوی کردەوە، وە کۆی (بَيْت) (أبْيَات)ە و (بُيُوت)ە.

(مَثَابَةً ): لە (ثَـابَ، يَثُـوب)ەوە هـاتوە، یـانی: (رَجَـعَ، يَرجِـعُ)، وە (الـمَثَـابَةُ: يَعْنِـي مَكَانَ الرجُوع)، مەکـۆ، شـوێنێك کـە خـەڵك لێـی خڕدەبێتـەوەو کـۆدەبێتەوە، یاخود ئەو شوێنەی کە خەڵك پاداشتی لێ دەست دەکەوێ.

(وَأَمْنًا ): (أمْـن)، واتـە: ئاسـایش، هێمنیـی، (أصْـلُ الأمْـنِ: طُمْأنِينَـةُ النَّفْـس و زَوَال الخَوْف)، لە ڕیشـەدا (أمْن)، واتـە: نـەفس ئـارام بگـرێ وە ترسـی نەبـێ، واتـە: هێمنیی و ئاسـایش.

(مَقَامِ إِبْرَٰهِۦمَ ): (الـمَقَامُ: مَوْضِـعُ القَـدَمَيْنِ ويـأتي بمعنـى المَجلـس وبمعنـى مَكَـان الإقَامـةَ والإقامـةَ)، (الـمَقَامُ): شـوێنی دوو پێیـەکانی ئینسـانە، کـە لەسـەری دەوەستێ، هەروەها بەمانای کۆڕو مەجلیسیش هاتوە، وە بەمانای شـوێنی تێـدا نیشتەجێ بوونو، بەمانـای نیشـتەجێبوونیش دێـت.

(مُصَلًّى ): (مَكَان الصَّلاة)، واتە: شـوێنی نوێژ، نوێژگە.

(وَعَهِدْنَآ ): (أَلْقَيْنَـا إلَيْـهِ العَهْـدَ، وَوَصَّـيْنَاهُ وأمَرْنَـاهُ) واتـە: پەیمانمـان لەگـەڵ بەسـت، وە وەسیەتمان بۆ کـرد، یاخود فەرمانمان پێکـرد.

(لِلطَّآئِفِينَ ): واتـە: ئەوانـەی کـە طـەواف دەکـەن، (الطَّـوْفُ: الـمَشْـيُ حَوْلَ الشَّـيء، طَـافَ يَطُـوُف طَـوْفاً) ڕۆیشـتن بە دەوری شـتێکدا پێـی دەگـوترێ: (الطَّـوافُ)، دەگوترێ: (طَـافَ يَطُـوُف طَوْفاً) سووڕایەوە، دەسووڕێتەوە، سووڕانەوە.

(وَٱلْعَـٰكِفِينَ ): کۆی (عَاكِـفَ)ە، (العُكُـوفُ: الإقْبَـالُ عَلَـى الشَّـيء وَمُلاَزَمَتُـهُ عَلَـى سَبِيلِ التَّعْظِيمِ لَـهُ)، بریتیە لەوەی ئینسان ڕوو لـە شـتێك بکـاو بـەری نـەداو لەگەڵی بـێ، بەشـێوەی بەگـەورەگرتن.

(وَفـي الشَّـرْعِ: هُوَ الإحْتِبَاسُ في الـمَسْجدِ عَلَى سَبِيلِ القُرْبَةِ)، (إعتِكَاف): لەڕووی شەرعەوە بریتیە لە مانـەوە لـە مزگـەوت، بەشـێوەیەك کـە بتـەوێ لـە خوا نزیك ببیەوە، بەهۆی ئەو مانەوەیەوە.

(ٱلثَّمَرَٰتِ): (الثَّمَرُ: اسْمٌ لِكُلِّ مَا يُطْعَمُ مِنَ أحْمَالِ الشَّجَرِ، الواحِدَةُ ثَمَرَة) (الثَّمَرُ): هەر شتێکە کە درەخت هەڵیبگرێ لە بەروبوومو میوەیەك کە بخورێ، تاکەکەی (ثَمَرَة)یەو، کۆیەکەی (ثِمَار) یاخود (ثَمَرَات)ە، بە هەردووکی کۆدەکرێتەوە، واتە هەم بە (جَمْع التَّكْسِير) هەم بە (جَمْع المُؤَنَّث السَالم).

(فَأُمَتِّعُهُۥ): واتە: پێی دەگوزەرێنم، دەیژێینم، (المُتُوعُ: الإمْتِدَادُ والإرْتِفَاعُ) (متوع) بریتیە لە درێژبوونەوەو بەرزبوونەوە، (يُقَالُ: مَتَعَ النَّهَارُ وَمَتَعَ النَّبَاتُ) دەگوترێ: ڕۆژ درێژبۆوەو ڕووەکەکە هەڵساو بەرزبۆوە، (وَالمَتَاعُ: انْتِفَاعٌ مُمْتَدُّ الوَقْتِ يُقَالُ: مَتَّعَهُ اللهُ بِكَذَا، وَأمْتَعَهُ)، (متاع) ئەوەیە کە ئینسان سوود لە شتێك ببینێ بۆ ماوەیەك، دەگوترێ: خوا بەو شتە پێی گوزەراندو پێی بەخشی ماوەیەك، (مَتَّعَهُ) دەگوترێ، (وَأمْتَعَهُ)ش دەگوترێ.

(أَضْطَرُّهُۥٓ): واتە: ناچاری دەکەم، پەلکێشی دەکەم، بەرەو ئەوە کە پێی ناخۆشە. ئەسڵەکەیشی لە: (الضُّرُّ: سوءُ الحَالِ) (حاڵی خراپ)ەوە هاتووە، (الإضْطِرَارُ: حَمْلُ الإنْسَانِ عَلَى مَا يَضُرُّهُ أو يَكْرَهُهُ)، (الإضْطِرَارُ): ئەوەیە کە ئینسان ناچار بکرێ لەسەر شتێك کە زیانی بۆی هەیەو پێی ناخۆشە.

(ٱلْقَوَاعِدَ): (قَوَاعِد، البِنَاء: أساسه)، (قَوَاعد) واتە: بناغە (البِناء) واتە: خانوو.

(مُسْلِمَيْنِ لَكَ): واتە هەردووکمان بۆت گەردن کەچ بووین، دیارە وشەی (مُسلمين) لە وشەی (إسلام)ەوە هاتوە، وشەی (إسلام)یش دوو واتای هەیە: واتایەکیان لە خوار ئیمانەوەیە، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ قَالَتِ ٱلْأَعْرَابُ ءَامَنَّا قُل لَّمْ تُؤْمِنُوا۟ وَلَٰكِن قُولُوٓا۟ أَسْلَمْنَا وَلَمَّا يَدْخُلِ ٱلْإِيمَٰنُ فِى قُلُوبِكُمْ ...﴿١٤﴾ ﴾ الحجرات، واتە: عەرەبە خێڵەکییەکان گوتیان: ئیمانمان هێناوە (خوای پەنهانزان بە پێغەمبەر دەفەرموێ) پێیان بفەرموو ئیمانتان نەهێناوە، بەڵکو بڵێن:

ئیسلام بووین، وە جارێ ئیمان نەچۆتە دڵتانەوە. ئیسلام بەو چەمکە شتێکە لە خوار ئیمانەوەیە، کەسێك بەڕواڵەت خۆی بە ئیماندار نیشان بدات، بەڵام ئیمانی نەچووبێتە دڵەوە، کە دیارە بۆ قیامەتێ ئەو جۆرە ئیسلامە بایی فلسێکە. مانای دووەمی وشەی ئیسلام لەسەرووی ئیمانەوەیە، کە بریتیە لە گەردن کەچییەك بۆ خوا کە بەشێك لەو گەردن کەچییە پەیوەندی بە دڵو دەروونو بە قەناعەتی نێودڵو، بە تەسلیمبوونی دڵو دەروونەوە هەیە، وە بەشەکەی دیکەشی بریتیە لە گەردن کەچیی ئەندامەکانو ڕواڵەتی ئینسان، کە ئەوەیان بەرزترە لە ئیمان، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ إِذْ قَالَ لَهُۥ رَبُّهُۥٓ أَسْلِمْۖ قَالَ أَسْلَمْتُ لِرَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٣١﴾ ﴾ البقرة، واتە: کاتێك پەروەردگاری بە ئیبراهیمی فەرموو: گەردنکەچ بە، گوتی: من گەردنکەچم بۆ پەروەردگاری جیهانەکان، جا کە لێرەدا دەفەرموێ: (أَسْلَمْتُ) مەبەست پێی مانای دووەمی ئیسلامە، واتە: بەتەواویی گەردن کەچم بۆ تۆ ئەی پەروەردگار، ئەگەرنا پێشتریش ئیمانی هەبووە، بەڵام ویستوویەتی بەتەواویی گەردنکەچ بێو، گرێو گۆڵی تێدانەمێنێ.

(وَأَرِنَا): واتە، وە پێشانمان بدە.

(مَنَاسِكَنَا): (مَنَاسِك) كۆی (مَنْسَك) یان (مَنْسِك) كە دوو واتای هەیە، بەمانای خوا پەرستیی دێ، وە بەمانای شوێنی خوا پەرستییش دێ، لێرەدا كە دەفەرموێ: (وَأَرِنَا مَنَاسِكَنا: أَي: مَوَاقِفَ النُّسُكِ وَأعمَالُهَا وَخُصُوصَاً الحَجِ أَو مَوَاضِعَهَا)، واتە: شوێنەكانی خوا پەرستییمان نیشانبدە وە كردەوەكانی خواپەرستی بەتایبەت كردەوەكانی حەج، یان شوێنەكانی تێدا ئەنجامدرانی حەج.

(وَتُبْ عَلَيْنَآ): (التوبُ: تَرْكُ الذَّنْبِ عَلَى أجْمَلِ الوُجُوه)، (تَوْبُ)، واتە: وازهێنان لە گوناح بە شێوەیەكی زۆر جوان، (تَابَ) ئەگەر بەنسبەت بەندەوە بێ،

واتە گەڕایەوە بۆ لای خواو، وازی هێنا لە گوناح، وە بەنسبەت خواوە: (تَابَ اللهُ عَلَيهِ) واتە: خوا ﷻ گەڕانەوەکەی لێ قەبووڵ کرد.

(ٱلْكِتَٰبَ): لێرە بەمانای بەرنامە دێت، نەك بەمانای قورئان (وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلْكِتَٰبَ)، واتە: بەرنامەو شەریعەتیان فێردەکات.

(وَٱلْحِكْمَةَ): (الحِكْمَةُ: إصَابةُ الحَقِّ بالعِلمِ والعَقْلِ، أو مَعْرِفة المَوْجُودَات وفعلُ الخَيرَاتِ، أو فهم حَقَائقِ القُرآن)، وشەی (حِكْمَةُ) بە چەند شێوەیەك لێکدراوەتەوە:

**یەکەم:** کە ئینسان هەق بپێکێ بە عەقڵ‌و بە عیلم.

**دووەم:** کە ئینسان دروستکراوەکان بناسێ‌و کردەوە چاکەکانیش ئەنجام بدات.

**سێیەم:** تێگەیشتنی ڕاستیەکانی قورئان.

دەشتوانین بڵێین: (الحِكْمَة)، واتە: کارامەیی‌و وەستایی لە جێبەجێکردنی شەریعەت‌و بەرنامەی خوادا.

(وَيُزَكِّيهِمْ): (أصْلُ الزَّكَاةِ: النُّمُوُّ الحاصِلُ عَن بَرَكَةِ الله تعالى، الزَكَاةُ: البَرَكَةُ والنَّماء والطَّهارَة والصَّلاح وصفْوَةُ الشَّيء والمقدار الَّذي حدَّدَهُ الشرع أن يُعْطى الفُقَراء من أموال الأَغنياء)، واتە: ئەسڵی وشەی (الزَّكَاة) یانی گەشەکردن بەهۆی بەرەکەتی خوای بەرزەوە، وە وشەی (زکاة) بە چەند مانایەك دێت: بەمانای گەشەکردن‌و پاکبوونەوەو چاك بوون، وە بەمانای پوختەی شتیش دێت، وە مانای ئەو ئەندازەیەش دێت کە شەرع دیاری کردوە لە ماڵی دەوڵەمەندان بدرێ بە هەژاران، کە ئەوەش پێی دەگوترێ زەکات.

## هـۆی هاتنە خـوارەوەی ئایەتەکـان

هۆی هاتنـەخوارەوەی ئـەو ڕسـتە قورئانییـەی کـە دەفـەرمووێ: ﴿ وَٱتَّخِذُواْ مِن مَّقَامِ إِبْرَٰهِـۧمَ مُصَلًّى ﴾، {عَن عُمَرَ بنِ الخَطَّاب ﷺ، قَالَ وافَقْتُ اللهَ في ثَلاَثٍ، أو وافَقَني رَبِّي في ثَلاَثٍ، قُلْتُ: يارَسولَ الله، لَو اتَّخَذْتَ مَقَامَ إبراهيمَ مُصَلَّى، فَأَنْزَلَ اللَّهُ: ﴿ وَٱتَّخِذُواْ مِن مَّقَامِ إِبْرَٰهِـۧمَ مُصَلًّى ﴾ وَقُلْتُ: يَارَسولِ الله يَدْخُلُ عَلَيْكَ البَرُّ والفَاجِرُ فَلَوْ أَمَرْتَ أُمَّهَاتِ المُؤْمِنِينَ بِالحِجَابِ، فَأَنْزَلَ اللهُ آيَةَ الحِجَابِ، واجتَمَعَ عَلَى رَسولَ الله نِسَاءهُ في الغَيرة فَقُلْتُ: لَهُنَّ عَسَى رَبُّهُ إنَّ طَلَّقكُنَّ أن يُبدِلَهُ أزوَاجاً خَيراً مِنكُن مُسلِماتٍ، فَأَنْزَلَ اللهُ: ﴿ عَسَىٰ رَبُّهُۥٓ إِن طَلَّقَكُنَّ أَن يُبْدِلَهُۥٓ أَزْوَٰجًا خَيْرًا مِّنكُنَّ مُسْلِمَٰتٍ ...﴿٥﴾ ﴾ التحريم،} (رَوَاهُ البُخاري برقم: (٤٤٨٣)، عَنْ أنَس بْنِ مَالِكٍ)، واتـە: عومـەری کوڕی خـەتتاب خوا لێـی ڕازی بێ دەڵێ: لـە سێ شتاندا بۆچوونی من لەگەڵ فەرمانی خـوادا تێکی کـردەوە، یان فـەرمانی پەروەردگـارم لەگـەڵ پێشـنیاری مندا یەکـی گرتەوە:

یەکەمیان: ئەوە بوو کاتێك طەوافمان دەکـرد، عەرزی پێغەمبـەرم کـرد ﷺ گوتـم: ئەی پێغەمبەری خوا ! ئەگەر لەو شوێنەی کە ئیبـڕاهیم لێی وەسـتاوە نوێژمان لێ بکردبـایە، خـواش ﷻ ئەم ئایەتـەی نـاردە خـوارەوە: ﴿ وَٱتَّخِذُواْ مِن مَّقَامِ إِبْرَٰهِـۧمَ مُصَلًّى ﴾، واتـە: ئـەو شـوێنەی کـە ئیبـڕاهیم لێـی وەسـتاوە بیکـەنە شـوێنی نوێژو نوێـژی لێبکـەن.

دووەمیـان: وە پـێم گـوت: ئـەی پێغەمبـەری ﷺ خـوا ! خەڵـکی چاك‌و خـراپ دێتـەماڵتان، ئەگەر بـە خێزانـەکانت گـوتبا خـۆ داپۆشـن‌و پـەردە بگرنـەوە (بۆم پێشـنیار کرد) ئیدی خوا ئایەتی پـەردەی نـاردە خـوارێ، کـە دەفـەرموێ: ﴿ وَإِذَا سَأَلْتُمُوهُنَّ مَتَٰعًا فَسْـَٔلُوهُنَّ مِن وَرَآءِ حِجَابٍ ﴾، واتـە: ئەگـەر شـتێکتان

لە هاوسەرانی پێغەمبەر ﷺ داواکرد، لە پشت پەردەوە لێیان داوا بکەنن (کە دیارە لە پشت پەردەوە بوون تایبەتە بە هاوسەرانی پێغەمبەر ﷺ، دایکانی مسولْمانان).

{دیارە (حِجَاب) جیایە لە خۆ داپۆشینی ئافرەتان، هەرچەندە دەگوترێ: (حِجَاب)، بەلاّم لەڕاستیدا (حِجَاب) واتە: پەردە، ئەمما ئەوەی دیکە پێی دەگوترێ: (سِتر، لِبَاس، جلبَاب)}.

سێیەمیان: کاتێك هاوسەرانی پێغەمبەر ﷺ گەلە کۆمەکێیان لێکرد لە مەسەلەی هەوێ ساریی‌و غەیرەدا پێم گوتن: نزیکە ئەگەر تەلاّقتان بدات پەروەردگاری ئافرەتی باشتر لە ئێوەی بۆ بێنێ، خوای کاربەجێش ئەو ڕستە قورئانییەی ناردە خوارێ، کە دەفەرموێ: ﴿عَسَىٰ رَبُّهُۥٓ إِن طَلَّقَكُنَّ أَن يُبْدِلَهُۥٓ أَزْوَٰجًا خَيْرًا مِّنكُنَّ مُسْلِمَٰتٍ ...﴿٥﴾﴾ التحريم.

## مانای گشتی ئایەتەکان

خوا ﷻ بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ، هەروەها وە بەهەر کەسێك کە قورئان دەخوێنێتەوە: ﴿وَإِذِ ٱبْتَلَىٰٓ إِبْرَٰهِـۧمَ رَبُّهُۥ بِكَلِمَٰتٍ فَأَتَمَّهُنَّ﴾، واتە: یاد بکەوە کاتێك پەروەردگاری ئیبراهیم، ئیبراهیمی تاقیکردەوە بەچەند ئەرکێك، بەلاّم بۆچی ناوی لێناون: (كَلِمَات)؟ چونکە ئەو ئەرکانەی کە ئاڕاستەی ئیبراهیم کراون، بە وشە موبارەکەکانی خوا ئاڕاستەی کراون‌و فەرموویەتی وابکەو وامەکە، بۆ وێنە: کاتێ کە پێی فەرموو: ئیسماعیلی کوڕت سەربڕە، وە کاتێك کە پێی فەرموو: دەبێ هاجەرە لەگەڵ ئیسماعیل بەری لەو شوێنەی کە دوایی کەعبەی لێ دروست کرا، نیشتەجێیان بکەی، وە کاتێك کە بە فەرمانی خوا چووە نێو ئاگری سوورەوە، کە کافرەکان ئاگرێکی بلێسەداریان بۆ سازکردو لەسەر خوا چووە نێوی، وە کاتێك کە لە پێناوی خوادا کۆچی کرد بۆ شام، پاشان کۆچی کرد بۆ میسر، ئیبراهیم ؑ هەموو ئەو فەرمان‌و ئەرکانەی بەتەواویی جێبەجێکردوون. جا ئیبراهیم ﷺ

کاتێـك هـەموو تاقیکردنـەوەکانی گوزەرانـد ﴿ قَالَ إِنِّي جَاعِلُكَ لِلنَّاسِ إِمَامًا ﴾، خـوا پێی فەرموو: من دەمـەوێ بتکەمـە پێشەوا بـۆ خـەڵکی، بتکەمـە پێشڕەو، بتکەمـە چاوسـاغ لـە دینداریـیدا لـە بەندایەتییکردنـدا بـۆ خـوا ﴿ قَالَ وَمِن ذُرِّيَّتِي ﴾، ئیبـراهیم پاڕایەوە، یاخود لێی پرسیو فەرمووی: لە وەچەکەشم ئیمامو پێشەوایان دادەنێی، یان هەر بۆ خۆم؟! ﴿ قَالَ لَا يَنَالُ عَهْدِي الظَّالِمِينَ ﴾، (خـوا) فـەرمووی: ئەوانەی ستەمکارن پەیمانی من نایانگرێتەوە، واتـە: لـە وەچـەی تـۆ کەسانێك کـە سـتەمکارو خراپـەکاربن، بـەڵێنو پـەیمانی خـوا نایگرێتـەوە، هەرچـەندە کـوڕی (ئیبـراهیم)یش بێ ﴿ وَإِذْ جَعَلْنَا الْبَيْتَ مَثَابَةً لِّلنَّاسِ وَأَمْنًا ﴾، ئنجا دێتـە سـەر باسی شتێکی دیو دەفەرموێ: یادبکەوە کاتێك کە (بَیْت)مان گێڕا بەشوێنی کۆبوونـەوەی خەڵك، وە کردمانـە شـوێنی ئاساییش {لێرەدا مەبەسـت لـە (بَیْت) مـاڵی خوایـە، دیارە هەموو مزگەوتەکان ماڵی خوان، بەڵام خوا ماڵێکی تایبەتی هەیە، کە بریتیـە لـە کەعبـە، کـە یەکـەمین مـاڵی خـوا بـووە لەسـەر زەوی دانـراوە، وەك دەفـەرموێ: ﴿ إِنَّ أَوَّلَ بَيْتٍ وُضِعَ لِلنَّاسِ لَلَّذِي بِبَكَّةَ مُبَارَكًا وَهُدًى لِّلْعَالَمِينَ ﴿٩٦﴾ ﴾آل عمـــــــران، یەکەمین ماڵێك کە بۆ خەڵکی دانرابێ لەسەر زەوی (وەك مـاڵی خـواو وەك ڕەمـزو هێمایەك بۆ ماڵی خوا کە طـەوافی بکەنو خوا پەرسـتیی تێدا بکـەن) ئـەو ماڵەیـە کە لە بەککەیە (واتـە: مەککـە)یـە}، بـە پیـتو پێزەو ڕێنمـایی یـە بـۆ خەڵـکی، ئنجا دەفەرموێ: ﴿ وَاتَّخِذُوا مِن مَّقَامِ إِبْرَاهِيمَ مُصَلًّى ﴾، وە ئەو شوێنەی ئیبڕاهیم لێی وەسـتاوە بیکەن بە نوێژگە، کـە ئێسـتا سـوننەتە هەرکات ئینـسان طەوافـی کـرد، بـچێ دوو ڕکـات نوێـژ لـە بـەردەم ئـەو بـەردە بکـات، کـە پێـی دەگـوترێ شـوێنی لێوەسـتانی ئیبـراهیم ﷺ (مقـام إبـراهیم)، کـە لەسـەر ئـەو بـەردەوە بینـای کەعبەی کردوە، کـاتێك کـە دیوارەکە بەرزبۆتەوە ﴿ وَعَهِدْنَا إِلَىٰ إِبْرَاهِيمَ وَإِسْمَاعِيلَ أَن طَهِّرَا بَيْتِيَ لِلطَّائِفِينَ وَالْعَاكِفِينَ وَالرُّكَّعِ السُّجُودِ ﴾، وە بـە ئیبـڕاهیمو بـە ئیـسماعیلمان ڕاگەیانـد، کـە ماڵەکـەم پـاك بکەنـەوە، بـۆ طـەواف کـەرانو بـۆ

خەڵوەکێشان (ئەوانەی خەڵوەدەکێشن‌و دەچنە ئیعتیکافەوە) وە بۆ ڕکووع بەران‌و کڕنووش بەران، پاکی بکەنەوە لە هەرشتێك کە لەگەڵ خوا پەرستیی‌و بەندایەتیی بۆ خوادا ناگونجێ ﴿ وَإِذْ قَالَ إِبْرَاهِيمُ رَبِّ اجْعَلْ هَٰذَا بَلَدًا آمِنًا ﴾، وە یادبکەوە کاتێك ئیبراهیم پاڕایەوە، گوتی: ئەی پەروەردگارم ئەم وڵاتەو ئەم شوێنە (واتە: مەککەو دەوروبەری) بکە بە شوێنێ ئاسایش ﴿ وَارْزُقْ أَهْلَهُ مِنَ الثَّمَرَاتِ مَنْ آمَنَ مِنْهُمْ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ ﴾، وە دانیشتووانەکەی ئەوانەیان کە ئیمانیان بەخواو بە ڕۆژی دوایی هەیە، ڕۆزییان بدە، بەشیان بدە لە بەرووبوومو لە میوەجات ﴿ قَالَ وَمَنْ كَفَرَ فَأُمَتِّعُهُ قَلِيلًا ﴾، خوا ﷻ فەرمووی: ئەوەیش کە کافریش بێت، کەمێك ژیانی دنیای پێ دەگوزەرێنم (هەرچەندە ژیانی دنیا بۆ خۆی هەرکەمە) ﴿ ثُمَّ أَضْطَرُّهُ إِلَىٰ عَذَابِ النَّارِ ۖ وَبِئْسَ الْمَصِيرُ ﴾، دوایی پەلکێشی دەکەم بەرەو ئازاری ئاگر، خراپترین سەرەنجامیش چوونە دۆزەخو ئاگرە، ئنجا خوا دەفەرموێ: ﴿ وَإِذْ يَرْفَعُ إِبْرَاهِيمُ الْقَوَاعِدَ مِنَ الْبَيْتِ وَإِسْمَاعِيلُ ﴾، وە یادبکەوە کاتێك ئیبراهیم‌و ئیسماعیل بناغەی کابەیان بەرزکردەوە {دەیانگوت}: ﴿ رَبَّنَا تَقَبَّلْ مِنَّا ۖ إِنَّكَ أَنْتَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ ﴾، پەروەردگارمان لێمان وەربگرە! بێگومان هەر تۆی بیسەری زانا (دووعامان دەبیستی‌و زاناشی بە پێداویستییەکانمان کە بۆمان جێبەجێ بکەی) ﴿ رَبَّنَا وَاجْعَلْنَا مُسْلِمَيْنِ لَكَ وَمِنْ ذُرِّيَّتِنَا أُمَّةً مُسْلِمَةً لَكَ ﴾، پەروەردگارمان وە ئێمە بگێڕە بە دوو گەردنکەچ بۆ خۆت (دوو مسوڵمانی تەواو عەیار)، وە لە وەچەکەشمان کۆمەڵێکی مسوڵمانی بە تەواوی گەردن کەچیان بۆ خۆت لێ بڕەخسێنە ﴿ وَأَرِنَا مَنَاسِكَنَا ﴾، وە شوێنی خوا پەرستییەکانمان، یاخود شوێنی ئەرکەکانی حەجمان پێشانبدە ﴿ وَتُبْ عَلَيْنَا ﴾، وە گەڕانەوەکەمان لێ قەبووڵ بکە ﴿ إِنَّكَ أَنْتَ التَّوَّابُ الرَّحِيمُ ﴾، بێگومان هەر تۆی تۆبە وەرگری بەخشندەی بە بەزەیی ﴿ رَبَّنَا وَابْعَثْ

﴿ فِيهِمْ رَسُولًا مِّنْهُمْ ﴾، وە پەروەردگارمان لە نێوانیاندا (واتە: لەنێو وەچەکەماندا) پێغەمبەرێك ڕەوانە بکە ﴿ يَتْلُواْ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتِكَ وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ ﴾، کە ئایەتەکانی تۆیان بەسەردا بخوێنێتەوە، وە کتێبو حیکمەتیان فێربکات {(كِتَاب)، بە تێگەیشتنی بەندە لێرەدا یانی: بەرنامەی ژیان (حِكْمَة)تیش، واتە: چۆنیەتی بەڕێوەبردنی ئەو بەرنامەیە بەشێوەیەکی لێزانانەو وەستایانە} ﴿ وَيُزَكِّيهِمْ ﴾، وە پاكو چاکیان بکات ﴿ إِنَّكَ أَنتَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴾، بێگومان هەر تۆی زاڵی کاربەجێ.

## چەند مەسەلەیەکی گرنگ

**مەسەلەی یەکەم:** تاقیکردنەوەی خوا ﷻ بۆ بەندەکانی یاسایەکە هیچ کام لە بەندەکان لێی هەڵنەوێردراون، واتە: خوا ﷻ بەندەکانی خۆی لە مرۆڤ و جنند هەموویان تاقی دەکاتەوە، سەرەتا تاقییان دەکاتەوە بە ئیمان، کێ ئیمان دەێنێ؟ کێ ئیمان ناهێنێ؟ دوایی دیارە ئەوانەی کافرنو ئیمان ناهێنن کەوتوو (ڕاسب) دەبن لە تاقیکردنەوەی ئیمان، ئنجا ئیمانداران تاقی دەکاتەوە بۆ ئەوەی دیاربێ هەر کامێکیان ئیمانیان چەندە؟ دینداریيەکەی چەندە؟ طاعەتو تەقوای چەندە؟ بەندایەتیی بۆ خوا تا چ ڕاددەیەکە؟ ئەوە حەقیقەتێکە کە خوا ﷻ لە زۆر لە ئایەتەکاندا دووبارەی کردۆتەوە، بۆ وێنە: یەکێ لەو ئایەتانە کە دوای چەند دەرسێك پێی دەگەین هەر لە سووڕەتی (البقرة)دا، دەفەرموێ: ﴿ وَلَنَبْلُوَنَّكُم بِشَيْءٍ مِّنَ ٱلْخَوْفِ وَٱلْجُوعِ وَنَقْصٍ مِّنَ ٱلْأَمْوَٰلِ وَٱلْأَنفُسِ وَٱلثَّمَرَٰتِ ۗ وَبَشِّرِ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴿١٥٥﴾ ٱلَّذِينَ إِذَآ أَصَٰبَتْهُم مُّصِيبَةٌ قَالُوٓاْ إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّآ إِلَيْهِ رَٰجِعُونَ ﴿١٥٦﴾ أُوْلَٰٓئِكَ عَلَيْهِمْ صَلَوَٰتٌ مِّن رَّبِّهِمْ وَرَحْمَةٌ ۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُهْتَدُونَ ﴿١٥٧﴾ ﴾، مەبەست لێرەدا ئەو ڕستەیەیە کە دەفەرموێ: ﴿ وَلَنَبْلُوَنَّكُم ﴾، بە دڵنیایی تاقیتان دەکەینەوە، کە هەندێك لە زانایان لێرە دەڵێن (ل) لامی (قَسَم)ە، سوێند بە خوا تاقیتان

دەکەینەوە، کێ تاقی دەکاتەوە؟ ڕووی دواندن (خِطَاب) لەگەڵ ئیماندارانە، پێغەمبەریش ﷺ ئەو حەقیقەتەی بە چەند فەرمایشتێکی خۆی ڕاگەیاندوە کە ئێمە تاقی دەکرێینەوە، بۆ وێنە: لە یەکێ لە فەرموودەکاندا کە بوخاریی لە ئەبو هورەیرەوە (خوا لێیان ڕازی بێت) دەیگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {(مَنْ يُرِدِ اللهُ بِهِ خَيْرًا يُصِبْ مِنْهُ) (رَوَاهُ البُخَارِي بِرقم: (٥٦٤٥)}، واتە: هەرکەسێك خوا چاکەی بۆی بوێ تووشی بەڵای دەکات، تووشی ناڕەحەتیی دەکات، چونکە (أصَابَ مِنهُ)، واتە: تووشی ناڕەحەتیی کرد، لە فەرموودەیەکی دیکەدا پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {(مَا يُصِيبُ المُسْلِمَ، مِنْ نَصَبٍ وَلاَ وَصَبٍ وَلاَهَمٍّ وَلاَ حَزَنٍ، وَلاَ أذًى وَلاَ غَمٍّ، حَتَّى الشَّوْكَةِ يُشَاكُهَا إلاَّ كَفَّرَ اللهُ بِهَا مِنْ خَطَايَاهُ)} (رَوَاهُ البُخاري برقم: (٥٦٤١)، ومُسلم برقم: (٦٥١٣)، والتِّرمِذِيُّ برقم: (٩٦٦)، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدريِّ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه) کە ئەمەش موژدەیەکی زۆرخۆشی تێدایە، دەفەرموێ: هیچ شتێك تووشی موسڵمان نابێ، لە ماندوویێتیو نەخۆشییو خەفەتو دڵتەنگییو ئازارو پەژارە، تەنانەت دڕکێك کە بەدەستی یان بە شوێنێکی دادەچێ، هیچ کام لەمانەی تووش نابێت مەگەر بەهۆی ئەوەوە گوناهەکانی لێ دەسرێتەوەو پاکی دەکاتەوە، ئنجا پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) لە هەموو کەس زیاتر تاقیکردنەوەیان قورستر بووەو، لە هەموو کەس زەحمەتتر تەجرەبە کراون، وەك پێغەمبەر ﷺ لەم فەرمایشتەدا فەرموویەتی: {(عَنْ أبي سَعيدٍ الخُدريِّ رضي الله عنه قَالَ: دَخَلْتُ عَلَى النَّبيِّ ﷺ وَهُوَ يُوعَكُ فَوَضَعْتُ يَدي عَلَيهِ فَوَجَدْتُ حَرَّهُ بَيْنَ يَدَيَّ فَوْقَ اللِّحَافِ فَقُلْتُ: يَا رَسولَ اللهِ! مَا أشَدَّهَا عَلَيْكَ؟ قَالَ: (إنَّا كَذَلِكَ يُضَعَّفُ لَنَا البَلاَءُ ويُضَعَّفُ لَنَا الأجْرُ) قُلْتُ: يَا رَسولَ اللهِ! أيُّ النَّاسِ أشَدُّ بَلاءً؟ قَالَ: (الأنْبِيَاءُ) قُلْتُ: يَا رَسولَ اللهِ! ثُمَّ مَنْ؟ قَالَ: ثُمَّ الصَّالِحُونَ، إنْ كَانَ أحَدُهُم لَيُبْتَلَى بِالفَقْرِ حَتَّى ما يَجِدُ أحَدُهُم إلاَّ العَبَاءَةَ يُحَوِيهَا، وَإنْ كَانَ أحَدُهُم لَيَفرَحُ بِالبَلاءِ كَمَا يَفْرَحُ أحَدُكُم بالرَّخَاءِ) (رَوَاهُ ابْنُ مَاجَهْ برقم: (٤٠٢٤)، وَصَحَّحَهُ الأَلبَاني فِي (السلسلة الصحيحة) برقم: (١٤٤)}،

واتە: ئەبو سەعیدی خودریی خوا لێی ڕازی بێت دەڵێ: ڕۆژێ چوومە لای پێغەمبەر ﷺ (تا)ی لێبوو بەدەنی گەرم بوو، دەستم لەسەر دانا، لەسەر لێفەکەوە {لەسەر ئەو شتەوە کە بەخۆی دادابوو، (اللِّحَافِ): هەر شتێکە کە بە خۆ دابدرێ وەك ئێمە دەڵێین: لێفە، بەتانی، پەشتەماڵ، ...} گەرمای دەهات گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا! ﷺ (تا)یەکەت زۆر توندە؟ فەرمووی: هەر بەو شێوەیەین (واتە: ئێمە پێغەمبەران) نەخۆشیی و ئازارمان بۆ چەند قات دەکرێتەوە، بەڵام پاداشتیشمان چەند قاتە، گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا! کێ لە هەموو کەس تاقیکردنەوەی قورسترە؟ فەرمووی: پێغەمبەران، گوتم: دوای ئەوان کێ؟ فەرمووی: چاکان {ئەوانەی کە بۆ خوا صوڵحاون، ئینسان تا چاکتربێ و لە خوا نزیکتربێ تاقیکردنەوەکەی قورسترە} یەکێکیان {واتە: لە صاڵحان یان پێغەمبەران} تاقیکراوەتەوە بە نەداریی، هەتا تەنیا ئەو عەبایەی هەبووە کە لە خۆیەوە گرتوە {کە خۆی پێ داپۆشێ} وەهی وایان هەبووە کاتێك کە تاقیکراوەتەوە بە سەختیی و بە ناڕەحەتییان، ئێوە چەندە بە خۆشییان دڵخۆش دەبن لە ئێوە دڵ خۆشتر بووە، {چونکە زانیویەتی پاداشتو قەرەبووی چاکتری لەلای خوا هەیە}.

هەروەها لە فەرمایشتێکی دیکەدا هاتوە: {(عَنْ مُصْعَبِ بْنِ سَعْدٍ عَنْ أَبِيهِ قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ أيُّ النَّاسُ أشَدُّ بَلاَءً؟ قَالَ: الأنْبِيَاءُ، ثُمَّ الأمْثَلُ فَالأمْثَلُ، يُبْتَلَى الرَّجُلَ عَلَى حَسَبِ دِينِهِ فَإنْ كَانَ فِي دِينِهِ صَلْبَاً اشْتَدَّ بَلاءُهُ، وإنَ كَانَ فِي دِينِهِ رِقَّةٌ ابْتُلِيَ عَلَى حَسَبِ دِينِهِ، فَمَا يَبْرَحُ الْبَلاَءُ بالْعَبْدِ حَتَّى يَتْرُكَهُ يَمْشِي عَلَى الأَرْضِ مَا عَلَيهِ خَطِيئَةٌ) (رَوَاهُ أَحْمَد برقم: (١٤٩٤)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٢٣٩٨)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٤٠٢٣)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٦٩٩)، وَالحَاكِمُ برقم: (١٢١)، وَقَالَ: الألباني حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، فِي (السلسلة الصحيحة) برقم: (١٤٣)}، واتە: ئەو هاوەڵە خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ، گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا! ﷺ کێ لە هەموو کەس تاقیکردنەوەی قورسترە؟ فەرمووی: پێغەمبەران، دوایی پێ بە پێ، {واتە: هەتا زیاتر مرۆڤ وەك

پێغەمبەران بچێت، لە ئیمان و عەقیدەو دینداریی و مسوڵمانەتییدا، تاقیکردنەوەکەشی قورستر دەبێت} پیاو (مرۆڤ) بەپێی دینەکەی تاقی دەکرێتەوە، هەتا دینەکەی بەقوەتتربێ، تاقیکردنەوەکەیشی قورستر دەبێ، ئەگەر لە دینەکەیدا پتەویی هەبێ، تاقیکردنەوەکەیشی قورستر دەبێ، بەڵام ئەگەر لە دینەکەیدا بێهێزیی هەبێ، تاقیکردنەوەکەیشی لەقەدەر دینەکەی دەبێ، وە تاقیکردنەوەو بەڵاو گرفتاریی بەردەوام دەبێت لەسەر بەندە، هەتا وای لێدێت کاتێ کە بەزەویدا دەڕوا یەك گوناهی پێوە نەماوە {بەهۆی بەڵاو گرفتاریی و نارەحەتییەکانەوە کە دێنە رێی}.

**مەسەلەی دووەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ بِكَلِمَٰتٍ ﴾ (كَلِمَات) کۆی (كَلِمَة)یە، واتە: وشە کە مەبەست پێی ئەو ئەرکانەن کە پێی سپاردوون، جا چ واجبێك بووبێ فەرمووبێتی جێبەجێی بکە، چ قەدەغەیەك بووبێ فەرمووبێتی توخنی مەکەوە، واتە: ئەو فەرمانانەی کە خوا بۆی دەرکردوون و ئەو ئەرکانەی پێی سپاردوون، بۆیەش ناو لەو ئەرکانە نراوە (كَلِمَات)، چونکە فەرمان و ئەرکەکان بە وشە تەعبیر دەکرێن و ئاڕاستە دەکرێن.

**مەسەلەی سێیەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ فَأَتَمَّهُنَّ قَالَ إِنِّي جَاعِلُكَ لِلنَّاسِ إِمَامًا ﴾، واتە: ئیبراهیم هەموو ئەرکەکانی تەواو کردوون و لە هەموو تاقیکردنەوەکان دەرچووە، ئنجا شایستەی ئەوە بووە کە خوای پەروەردگار بیکات بە پێشەوا بۆ خەڵکی، بەڵێ ئیبراهیم ﷺ هەموو فەرمانەکان و ئەرکەکانی بە تەواویی ئەنجامدان، ئنجا خوای پەروەردگار فەرمووی دەتگێڕم بە پێشەوا بۆ خەڵکی، کەواتە: کەسێك بە کەڵکی ئەوە دێت کە خەڵك بیکاتە سەر مەشق، وە ببێتە رێنیشاندەر بۆ خەڵکی و، فێری بەندایەتییان بکا بۆ خواو، فێری مسوڵمانەتییان بکاو فێری دینداریییان بکا، کە ئیمانەکەی هێندە چاك و پتەو بێ لە تاقیکردنەوەکان دەرچووبێ، ئەگەرنا بابای کەوتوو (راسب) خەڵك تەماشای کوێی بکات ؟! مەگەر کەوتنی لێوە فێربن ! کەواتە: ئینسان دەبێت ئەگەر خوا ﷻ وای لێکرد کە جێی سەرنج و تەماشای خەڵك بێت بۆ دینداریی،

لەخۆی وریا بێ لە تاقیکردنەوەکان نەکەوێ، ئنجا بەکەڵکی ئەوە دێت کە خەڵك دینداریی و مسوڵمانەتیی لێوە فێربێ، جا بە هەرشتێك تاقی بکرێتەوە، بە سەختییان یان بە خۆشیان، چونکە خوا دەفەرموێ: ﴿ ... وَنَبۡلُوكُم بِٱلشَّرِّ وَٱلۡخَيۡرِ فِتۡنَةً ...﴿٣٥﴾ ﴾الأنبياء، واتە: بە ناخۆشیی و بە خۆشییان تاقیتان دەکەینەوە، مەرج نیە ئینسان هەر بە ناخۆشییان تاقی بکرێتەوە، جاری وا هەیە بە خۆشییان تاقی دەکرێتەوە، خوای پەروەردگار دەسەڵاتی دەداتێ، زانیاری دەداتێ، لەشی ساغی دەداتێ، نیعمەتی پێ دەبەخشێ، داخۆ چی لەو نیعمەتانە دەکات ؟ چۆنیان مامەڵە پێدەکات ؟ وە چۆنیان بەکاردەهێنێ؟ جا هی وا هەیە لە سەختییان دەردەچێ، بەڵام لە خۆشییان دەکەوێ، وەك یەکێ لە هاوەڵان گوتوویەتی: ((أُبتُلينا بالفَقْرِ فَصَبَرْنَا فَلَمَّا ابتُلينا بالغِنَى فَمِنَّا مَنْ صَبَرَ وَمِنَّا مَنْ لَمْ يَصْبِر))، واتە: تاقیکراینەوە بە هەژاریی و بە نەداریی خۆڕاگر بووین، بەڵام کاتێ بە دەوڵەمەندیی تاقیکراینەوە، هەمان بوو خۆڕاگر بوو، هەمان بوو خۆی ڕانەگرت، واتە: دەرنەچووو وەك پێویست نەبوو.

**مەسەلەی چوارەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ لَا يَنَالُ عَهۡدِي ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾، دیارە ئیبراهیم عليه السلام وەك شتێکی فیطریی پێی خۆشە لە وەچەکەشیدا پێغەمبەران هەبن، پیاو چاکان هەبن، پێشەوا هەبن بۆ خەڵك، بەڵام خوا تعالى حەقیقەتێکی پێ ڕادەگەیەنێ، کە وەك یاسایەك وایە بۆ ئیبراهیمیش و بۆ هەموو کەسێکی دیکەش، ئەویش ئەوەیە کە: ئەوانەی ستەمکارن پەیمانی من کە بیانکەمە پێشەوا، نایانگرێتەوە، واتە: کەسێك ستەمکاربێ، کە ستەمکار (زاڵم) بە هەر کەسێك دەگوترێ دەستدرێژیی بکات بۆ سەر غەیری خۆی، یاخود دەستدرێژیی بکات بۆ سەر ئەو طاعەت و ئەرکانەی کە خوا لەسەری پێویست کردوون، یان قەدەغەکان بشکێنێ، واتە: زاڵم مەرج نیە تەنها ستەم لە خەڵکی بکات و دەستدرێژیی بکات بۆ سەر ماڵ و نەفس و ناموسی خەڵك، بەڵکو خوای پەروەردگار لەسەر زمانی لوقمان خوا لێی ڕازیبێ، کە ئامۆژگاری کوڕەکەی دەکات دەفەرموێ: ﴿ وَإِذۡ قَالَ لُقۡمَٰنُ لِٱبۡنِهِۦ وَهُوَ يَعِظُهُۥ يَٰبُنَيَّ لَا تُشۡرِكۡ بِٱللَّهِۖ إِنَّ

ٱلشِّرۡكَ لَظُلۡمٌ عَظِيمٞ ﴿١٣﴾ ﴾لقمان، واتە: ڕۆڵە گیان! هاوبەش بۆ خوا دامەنێ چونکە هاوبەش بۆ خوا دانان ستەمێکی گەورەیە، کەواتە: (شِرك) (ظُلم)ە، وە هەر گوناهێك کە تۆ دەیکەی هەر نەبێ (ظُلم)ێکە لەخۆتی دەکەی، وە ستەم (ظُلم)ێکە لە دین دەیکەی، کە پێوەی پابەند نابی، جا کێ بە کەڵکی ئەوە دێت ببێتە پێشەوا بۆ خەڵك؟ کەسێك کە فەرمانبەر بێ بۆ خواو پابەندبێ بە شەریعەتی خواوەو ملکەچ بێ بۆ خوا، بەڵام کەسێك کە دەستی دەچێتە ستەم (ظُلم)ەوە، وەك گوتم ستەمکار (ظالم)، چ بەو مانایەی کە دەستدرێژیی دەکات بۆ سەر مافەکانی خەڵك، چ بەوەی ئەرکەکانی سەرشانی خۆی جێبەجێ ناکات، ئەو کەسە بە کەڵکی ئەوە نایەت ببێتە پێشەوا بۆ خەڵك‌و بە کەڵکی سەرپەرشتیاری خەڵك نایەت، لێرەدا زۆر لە زانایانی ئیسلام کە بەڕاستی منیش ئەو ڕایەم زۆر پێ پەسەندو بەجێیە، ئەم ڕستە قورئانییەیان کردۆتە بەڵگە لەسەر ئەوە کە هەر کەسێك ئەهلی زوڵم بێ، بەکەڵکی ئەوە نایەت کە مسوڵمانان بیکەنە پێشەوای خۆیان‌و بیکەنە سەرپەرشتیاری خۆیان، وە ڕایان وایە هەموو ئەوانەی کە زاڵم‌و زۆردارن بەیعەتێك کە پێیان دەدرێ، یاخود بە زۆر لە خەڵکی وەردەگرن، بەیعەتەکە جێی خۆی ناگرێ‌و، لە ڕاستیدا ئەو سەرپەرشتیارییەی کە دەیکەن بۆ خەڵك سەرپەرشتیارییەکی شەرعیی نیە، بەڵکو ئەوە هەقی خەڵکەو زەوتیان کردووەو داگیریان کردوە، هەر لێرەشەوە ئەو قسەیەمان بۆ لە مەحەك دەدرێ کە هەندێك لە زانایانی سیاسەتی شەرعیی دەڵێن: ئەو کەسەی سوڵتەی شەرعیی لەسەر مسوڵمانان بەدەستەوە دەگرێ، سێ ڕێی هەن، یان ئەوەتا مسوڵمانان هەڵیبژێرن: ﴿ ...وَأَمۡرُهُمۡ شُورَىٰ بَيۡنَهُمۡ ...﴿٣٨﴾ ﴾الشورى، یان ئەوەتا ئەو کەسەی کە دەسەڵاتی هەبووە وەسیەت بکات بۆ ئەوەی دوای خۆی، کە ئەوە پێی دەگوترێ (ولاية العهد)، یان ئەوەتا کەسێك دەسەڵاتی هەبێ خۆی بەسەر مسوڵمانان فەرز بکات، کە ئەوەش پێی دەگوترێ (ولاية المتغلِّب)، گوتوویانە ئەو سێیانە هەرسێکیان ڕێی شەرعیین،

بۆ ئەوە کە ئینسان لە کۆمەڵگای ئیسلامییدا دەسەڵاتی حوکمڕانیی بەدەستەوە بگرێ، بەڵام من زۆر بەڕاشکاویی دەڵێم: جگە لە ڕێی یەکەم کە ڕاوێژ (شوری)یە، ئەو دوو ڕێیەی دیکە، واتە: کە کابرا هەر لەبەر ئەوەی بابای پێش خۆی وەسیەتی بۆ کردوە، یان وەسیەت بۆ کوڕی دەکا، یان هەر لەبەر ئەوەی دەسەڵاتی هەبووەو غەڵەبەی کردوە بەسەر خەڵکدا، ڕەوایە ببێتە حوکمڕانی مسوڵمانانو لەڕاستیدا ئەو دوو ڕێیەی دیکە هیچیان شەرعیی نین، وە لەگەڵ ئەم ئایەتەدا تێکدەگیرێن، کە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿لَا يَنَالُ عَهْدِي الظَّالِمِينَ﴾، عەهدو پەیمانو بەڵێنی من کە کەسێك ببێتە پێشەواو حوکمڕان بەسەر خەڵکیدا، ستەمکاران ناگرێتەوە، کەواتە: کەسێك ستەمکارو گوناهکارو لادەرو لاڕێ بێ، ئەوە بەپێی شەرعی خوا شایستەی ئەوە نیە، وە مافی ئەوەی نیە بەسەر مسوڵماناندا ببێتە حوکمڕانو کاربەدەست.

**مەسەلەی پێنجەم:** خوا ﷻ دەربارەی کەعبە دەفەرموێ: ﴿مَثَابَةً لِّلنَّاسِ وَأَمْنًا﴾، کردوومانە بە جێگەی خڕبوونەوەو گردبوونەوەی خەڵكو مەکۆی خەڵك، وە شوێنێکی پڕ هێمنییو ئاسایش، دیارە هەموو کۆمەڵگایەکی بەشەریی پێویستی بەو دوو شتە هەیە:

١) لێك کۆبوونەوە، بۆ ئەوەی پێکەوە هاوکاربنو ژیانی دنیایان بسووڕێنن.

٢) بەڵام ئەو کۆبوونەوە لەسەر بناغەی هێمنییو ئاسایش بێ.

هیچ کۆمەڵگایەك بەبێ ئەو دوو مەرجە دروست نابێتو کۆمەڵگایەکی ساغو سەلیم ئەم دوو مەرجەی پێویستە:

یەکەم: دەبێ خەڵکەکەی لە یەك کۆببێتەوە، نەك هەریەکە لەلایەك بێ پەرشو بڵاوبن.

دووەم: هێمنییو ئاسایشی لەنێودا بەرقەراربێ، ئەگەرنا کۆبوونەوەیەك، کە شەڕو شۆڕو ئاژاوەی تێدابێت هیچ نیە.

**مەسەلەی شەشەم:** ئیبراهیم ﷺ دوو شتان داوا دەکات:

یەکەم: کە هێمنییو ئاسایش لەم ولاتەو لەم شوێنەدا هەبێ، کە مەبەست پێی (كعبة)و دەورووبەریەتی: ﴿ وَإِذْ قَالَ إِبْرَٰهِـۧمُ رَبِّ ٱجْعَلْ هَٰذَا بَلَدًا ءَامِنًا ﴾.

دووەم: وە خەڵکەکەشی ڕۆزیو ڕزقیان هەبێ: ﴿ وَٱرْزُقْ أَهْلَهُۥ مِنَ ٱلثَّمَرَٰتِ ﴾،

دیارە ئەم دوو شتەش هێمنییو ئاسایشو دابینکرانی ژیانو گوزەران واتە: فاکتەری ئەمنیی لەگەڵ فاکتەریی ئابووریی، دیسان پێکەوە دوو هۆکاری پێویستن بۆ بەرقەراربوونی هەر کۆمەڵگایەك.

**مەسەلەی حەوتەم:** کە خوای پەروەردگار فەرمان بە ئیبراهیم و ئیسماعیل (علیهما الصلاة السلام) دەکاتو دەفەرموێ: ﴿ وَعَهِدْنَآ إِلَىٰٓ إِبْرَٰهِـۧمَ وَإِسْمَٰعِيلَ أَن طَهِّرَا بَيْتِىَ لِلطَّآئِفِينَ وَٱلْعَٰكِفِينَ وَٱلرُّكَّعِ ٱلسُّجُودِ ﴾، لێرەدا ئەوان تازە ئەو ماڵی خوایە دروست دەکەن، کەواتە: مانای وایە هیچ شتێکی لێنەبووە کە پێچەوانەی پاکیی بێ، بەڵام مەبەست ئەوەیە بە پاکی ڕابگرن، وە فەرمانەکە بە ئیبراهیمو ئیسماعیل دەکا، بەڵام دوای وانیش دەگرێتەوەو، ماڵی خوا دەبێ پاك ڕابگیرێو، نابێ هیچ شتێکی تێدابێو، هیچ ڕواڵەتێکی تێدابێو، هیچ هەڵسوکەوتێکی تێدا بکرێ، کە پێچەوانەی بەندایەتییکردنو خواپەرستیی بێ.

ئنجا کەعبە کە سێ سەدو شەست بتیان تێدا دانابوو، پێچەوانەی دینی ئیبراهیم ﷺ بوو، بۆیە پێغەمبەر ﷺ کە چووە نێو کەعبەوە، گۆچانێکی پێبوو لە بتەکانیەوە دەژەنیو دەیفەرموو: ﴿ وَقُلْ جَآءَ ٱلْحَقُّ وَزَهَقَ ٱلْبَٰطِلُ ۚ إِنَّ ٱلْبَٰطِلَ كَانَ زَهُوقًا ﴿٨١﴾ ﴾ الإسراء، وە دەیفەرموو: موشریکەکانو بت پەرستەکان درۆیان کرد، ئیبراهیمو ئیسماعیل هەرگیز (أنصاب وأزلام)یان پێ نەبووە، چونکە وێنەی ئیبراهیمو ئیسماعیل - یان لە دیواری کردبوو کە (أنصاب و أزلام)یان لە دەستدابوو کەواتە: ﴿ طَهِّرَا ﴾، یانی: بە پاکی ڕابگرنو بە پاکی بهێڵنەوە، ئەگەرنا دیارە کە پێشتر پیسو پۆخڵ نەکراوە، تاکو ئیبراهیمو کوڕەکەی (علیهما السلام) پاکی بکەنەوە.

**مەسەلەی هەشتەم:** کە ئیبراهیم ﷺ دەفەرموێ: ﴿ وَٱرْزُقْ أَهْلَهُۥ مِنَ ٱلثَّمَرَٰتِ مَنْ ءَامَنَ مِنْهُم بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْـَٔاخِرِ ﴾، ئایا بۆ کێ دەپاڕێتەوە کە هێمنیی‌و ئاسایشیان بۆ دابین بکات‌و رزق‌و رۆزیی‌و میوەجاتیان بۆ پەیدابکات؟ دەفەرموێ: ئەوانەیان کە ئیمانیان هەیە بە خواو بەرۆژی دوایی، جا من پێم وایە، بۆیە ئیبراهیم ﷺ لێرەدا وایفەرمووەو تایبەتی کردوە بەوانەوە کە ئیماندارن، چونکە ئەو ئامۆژگارییەی کە خوا پێشتر کردی باشی وەرگرتوە، کاتێك بۆ هەموو وەچەکەی پاڕایەوە فەرمووی: ئەی خوایە ئایا لە وەچەکەشمدا پێشەوایان دادەنێیی؟ خواش فەرمووی: ﴿ قَالَ لَا يَنَالُ عَهْدِى ٱلظَّـٰلِمِينَ ﴾، ستەمکاران بێبەشن لە بەڵێن‌و پەیمانی من، بۆیە لێرەدا ئیبراهیم دووربینیی کردوەو گوتوویەتی: با کە داوای هێمنیی‌و ئاسایش‌و رزق‌و رۆزیی دەکەم، تەنیا بۆ ئەهلی ئیمان بێت، بەڵام خوا ﷻ فەرمووی: ﴿ قَالَ وَمَن كَفَرَ فَأُمَتِّعُهُۥ قَلِيلًا ﴾، ئەوەی کە کافریش بێت هەر دەیژیێنم کەمێك لە ژیانی دنیای پێ دەگوزەرێنم ﴿ ثُمَّ أَضْطَرُّهُۥٓ إِلَىٰ عَذَابِ ٱلنَّارِ ۖ وَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ ﴾، بەڵام دوایی پەلکێشی دەکەم‌و رایدەکێشم‌و ناچاریی دەکەم بەرەو ئازاری ئاگر، کە خراپترین سەرەنجامیش ئەوێیە، لەم ئایەتەشەوە ئەوە وەردەگیرێ، کە ئینسانی کافرو خەڵکی کافر بۆیان هەیە ژیانی دنیا بەرنە سەر، وە بۆیان هەیە لەژێر سایەی دەوڵەتی ئیسلامییدا بژین، چونکە خوا ﷻ مۆڵەتی داوە بە کافرانیش کە بژین‌و بۆخۆی فەرموویەتی: ﴿ وَمَن كَفَرَ فَأُمَتِّعُهُۥ قَلِيلًا ﴾، ئەوەی کافریش بێ ژیانی کەمی دنیایان پێ دەگوزەرێنم، کەواتە: ئەو رایەی زانایان راستە، کە دەڵێ: هەموو جۆرەکانی ئەهلی کوفرو هەموو جۆرە کافرەکان بە موونافیقان‌و هەڵگەڕاوانیشەوەو بە بتپەرستانیشەوە (نەك هەر ئەهلی کیتاب) بۆیان هەیە لەژێر سایەی دەوڵەتی ئیسلامییدا بژین، تاکو تاقیکردنەوەی ژیانی دنیایان تەواوبکەن، چونکە خوا ژیانی دنیای داناوە بۆ تاقیکردنەوەو مرۆڤ دەبێ مەجالی هەبێت ژیانی دنیای تەواو بکات‌و تاقیکردنەوەی خۆی بدا، ئنجا

دەکەوێ، یان دەردەچێ، بۆ خۆی لەوە بەرپرسیارە.

**مەسەلەی نۆیەم:** تەماشا بکە ئیبراهیم ﷺ کەنگێ لە خوا دەپاڕێتەوە ؟ ﴿وَإِذْ يَرْفَعُ إِبْرَٰهِـۧمُ ٱلْقَوَاعِدَ مِنَ ٱلْبَيْتِ وَإِسْمَـٰعِيلُ رَبَّنَا تَقَبَّلْ مِنَّآ ۖ إِنَّكَ أَنتَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ﴾، وە یادبکەوە کاتێك ئیبراهیمو ئیسماعیل بناغەی ماڵی خوایان بەرز کردەوە، ئنجا لە میانەی بناغە بەرزکردنەوەدا دەپاڕێنەوە، کەواتە: ئینسان دەبێ لە گەرمەی ئیشوکاردا وەپاڕێ، کاتێك کە سەرگەرمی بەندایەتیی بۆ خواو سەرگەرمی جێبەجێکردنی فەرمانەکانی خوای، ئنجا داوا لە خوا بکە، نەك پاڵ بدەیەوەو هەڵخزێیو لێیدانیشی، ئنجا بڵێی: خوایە ! ئەوەم بۆ بکە، ئەوەشم بۆ بکە، ئەوەم بۆ لەوێ دانێ، ئەوەشم بۆ لەوێ لابەرە ! ئەوە پێچەوانەی سوننەتی پێغەمبەرانە (علیهم الصلاة والسلام) پێغەمبەرانی خوا هەرچی لە دەستیاندا هاتوە کردوویانەو هەموو هۆیەکانیان دابینکردوە، هەموو هەوڵو کۆششی خۆیان خستۆتە کار، ئەوجار لە خوا پاڕاونەتەوە کە ئەو کارەیان بۆ تەواو بکاتو، لێیان قەبووڵ بکاتو بۆیان ئاسان بکات، کەواتە: شێوازی ڕاستی دووعا ئەوەیە کە ئینسان ئەوەی لە توانایدا هەیەو بەخۆی دەکرێ بیکات، ئنجا ئەوەی کە پێی ناکرێ، لە خوای داوا بکات بۆی تەواو بکات، وە دەبێ ئینسان کارەکەی بەڕێکیی بکاتو بەتەواویی بیکا، ئنجا ئومێدی ئەوەی هەبێت کە خوای پەروەردگار لێی قەبووڵ بکات.

**مەسەلەی دەیەم:** ئەوە کە ئیبراهیمو ئیسماعیل (علیهما الصلاة والسلام) بۆ وەچەکەی خۆیان دەپاڕێنەوەو دەڵێن: ﴿رَبَّنَا وَٱجْعَلْنَا مُسْلِمَيْنِ لَكَ وَمِن ذُرِّيَّتِنَآ أُمَّةً مُّسْلِمَةً لَّكَ﴾، واتە: پەروەردگارمان ئێمە بکە بە دوو گەردنکەچی تەواو بۆ خۆت، وە لە وەچەکەشماندا کۆمەڵێکی گەردنکەچیان تێدا پەیدابکە، کە بۆ تۆ بەتەواویی گەردنکەچو مسوڵمان بن. ئەم ڕستە قورئانییە ئەوەی لێ وەردەگیرێ کە ئینسان هەمیشە دووعا بکات بۆ ماڵو منداڵی خۆی، بۆ وەچەو هاوسەریو بۆ خزمانی، هەر بۆیەشە خوا ﷻ لە سوورەتی (الفرقان)دا لە

کۆتایی سیفەتەکانی (عباد الرحمن)دا، وە لە کۆتا وەسفیاندا دەفەرموێ: ﴿ وَٱلَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا هَبْ لَنَا مِنْ أَزْوَٰجِنَا وَذُرِّيَّٰتِنَا قُرَّةَ أَعْيُنٍ وَٱجْعَلْنَا لِلْمُتَّقِينَ إِمَامًا ﴿٧٤﴾ ﴾ الفرقان، واتە: وە ئەوانەی کە دەڵێن: پەروەردگارمان لە هاوسەرانمان و لە وەچەماندا مایەی دڵخۆشییمان بۆ بڕەخسێنە، {واتە: وایان لێبکە کە دڵمان پێیان خۆشبێ‌و، وایان لێبکە کە چاومان پێیان ڕۆشن بێ} وە بمانگێڕە بە پێشەوا بۆ پارێزکاران. وە ئەم ئایەتە ئەوەشی لێوەردەگیرێ کە کەسێك شایستەی ئەوە دەبێت ببێتە پێشەوا بۆ پارێزکاران، کە خەمیشی لە دەوروبەری خۆی خواردبێ، خەمی پەروەردەکردن‌و خەمی ڕاستەڕێکردن بە ڕێی شەرعدای، لێ خواردبن.

**مەسەلەی یازدەیەم:** ئەوەیە کە دوای ئەوەی ئینسان هەموو کارەکانیشی ئەنجام دەدا، هەر داوای لێبوردن لە خوا بکات، تەماشا دەکەین ئیبراهیم‌و ئیسماعیل پاش دروستکردنی کەعبە دەڵێن: ﴿ وَتُبْ عَلَيْنَآ إِنَّكَ أَنتَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ ﴾، وە تۆبەمان لێوەربگرە بێگومان تۆ تۆبە وەرگری بە بەزەیی‌و بەخشندەی، کەواتە: ئینسان پێویستە هەرکارێکی خێرو چاکی کردو هەر طاعەتێکی ئەنجامدا، ئنجا لە دواییشدا بگەڕێتەوە لای خواو بڵێ: خوایە گەڕانەوەکەم لێ قەبووڵ بکە، وە داوای لێبوردن لە خوا بکات، بۆیە پێغەمبەر ﷺ کە سەلامی نوێژێی داوەتەوە، سێ جاران فەرموویەتی: ((أستغفر الله، أستغفر الله، أستغفر الله))، واتە: داوای لێبوردن لە خوا دەکەم... بۆچی ؟ چونکە ئەو عیبادەت‌و طاعەتەی کە تۆ ئەنجامی دەدەی، شایستەی خوا نیەو دەبێ خوا بە لوتف‌و کەرەمی خۆی لێت وەربگرێ، بۆیە پێویست بەوە دەکات داوای لێبوردن لە خوا بکەی، نەك لە دڵی خۆتدا کۆمەڵێك منەتت بێتە دڵەوەو، پێت وابێ شتێکی گەورەت کردوە ! بەڵکو کە طاعەتێکت بۆ خوا ئەنجامدا، ئنجا داوای لێبوردنیش لە خوا بکە، کە خوا لێت وەربگرێ‌و لە کەموکوورتیی عەفووت بکات.

**مەسەلەی دوازدیەم:** ئیبراهیم و ئیسماعیل (علیهما السلام) داوا لە خوا ﷻ دەکەن، کە پێغەمبەرێك لەنێو وەچەکەیاندا بڕەخسێنێ، ئەم چوار ئەرکە ئەنجام بدات: ﴿ رَبَّنَا وَٱبْعَثْ فِيهِمْ رَسُولًا مِّنْهُمْ يَتْلُواْ عَلَيْهِمْ ءَايَـٰتِكَ وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلْكِتَـٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ وَيُزَكِّيهِمْ ۚ إِنَّكَ أَنتَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴾، پەروەردگارمان لە نێوانیاندا پێغەمبەرێك بنێرە (ڕەوانە بکە) کە ئایەتەکانی تۆیان بەسەردا بخوێنێتەوەو، کتێبیان فێربکاتو، حیکمەتیان فێربکاتو، تەزکیەیان بکات، بێگومان تۆ زاڵی کاربەجێی، بۆ زانیاریتان ئەم تەعبیرە لە قورئاندا لە چوار شوێندا هاتوە، هەر لە سوورەتی (البقرة)دا چەند ئایەتێك دوای ئەم ئایەتە هاتووەو، لە سوورەتی (آل عمران)یشدا هاتووەو، لە سوورەتی (الجمعة)شدا هاتوە، وە لە سێ شوێنان: ﴿ وَيُزَكِّيهِمْ ﴾، خراوەتە پێش ﴿ وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلْكِتَـٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ ﴾ و لە یەك شوێن: ﴿ وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلْكِتَـٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ ﴾، خراوەتە پێش ﴿ وَيُزَكِّيهِمْ ﴾، بەڵام لە هەر چوار شوێندا: ﴿ يَتْلُواْ عَلَيْهِمْ ءَايَـٰتِكَ ﴾، هەر لە پێشەوەیە، ئەمەش ئەوەی لێوەردەگیرێ کە بناغەو بنەڕەتی دینداریی بریتیە لە خوێندنەوەی ئایەتەکانی خواو، دەبێ پێشێ لە قورئانەوە دەست پێبکەی، لە خوێندنەوەو تێگەیشتنی قورئان، پاشان تەزکیە بوونو پەروەردە بوون، لەسەر بناغەو بەپێی ئەو ئایەتانە دەبێو، پاكو چاك دەبی، ئنجا دوایی دەبێ هەوڵبدەی کە شەریعەتو بەرنامەی ژیان هەر لەو ئایەتانە وەربگری، وە دواییش بەشێوەیەکی حەکیمانەو لێزانانە بەرنامەو ئەو شەریعەتە لە ژیانی تاکیی و خێزانیی و کۆمەڵیی خۆتدا پیادە بکەی، ئا ئەوانە چوار شادەمارو چوار پایەی گەورەی دینداریی و مسوڵمانەتیی و بەندایەتییکردنن بۆ خوا، خوای پەروەردگار لەو کەسانەمان بگێڕێ، کە بەندایەتی ڕاستەقینەو ڕاستو دروستی بۆ دەکەن.

سُبْحَانَكَ اللّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی بیست و حەوتەم

## پێناسـەی ئەم دەرسـە

ئەم دەرسـەمان پێنج ئایەت دەگرێتە خۆی، لە ئایەتی (١٣٠ تـاکو ١٣٤)، لـەم پێـنج ئایەتە بەپێزەدا خوا ﷻ باسی ئەوەمان بۆ دەکات کە مەگەر کەسێك نەفام بێت وە خۆی گێل کردبێ، ئەگەرنا هیچ کەسێك لە ڕێبازو لە ئایینی ئیبراهیم ﷺ لانـادات کە خوا ﷻ لە دنیاو لە دواڕۆژدا هەڵیبژاردوە، وە کاتێك کە پێـی فـەرمووە: گـەردن کەچبە! یەکسەر گەردنکەچیی خۆی بۆ خوای پەروەردگار دەربڕیوە، وە پاشان ئـەو ڕێبازو ئایینەی کە ئیبراهیم لەسەری بووە، هـەم ئیـبراهیم‌و هـەم یـەعقووب، کـوڕو نەوەو وەچەی خۆیان پێ وەسیەت کردوە کە لەسـەری بـن، بەتایبـەت یـەعقووب کـە لەکاتی سەرەمەرگدا ئامۆژگاریی کوڕەکانی خۆی دەکات، کە تـەنیا خوا ﷻ بپەرستن، وە لە کۆتاییدا خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ئەو کۆمەڵە واتە پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسـلام)و شوێنکەوتووەکانیان‌و نـەیارەکانیان ئەوانـەی کـە بـاس دەکـرێن، کەسانێکن تێپەڕبوون‌و گوزەراون، کە دیارە ئەوان لە کردەوەی خۆیان بەرپرسیارن، هەروەك چۆن ئێوەش ئەی مسوڵمانان! لە کردەوەی خۆتان بەرپرسیارن.

﴿ وَمَن يَرْغَبُ عَن مِّلَّةِ إِبْرَٰهِـۧمَ إِلَّا مَن سَفِهَ نَفْسَهُۥ ۚ وَلَقَدِ ٱصْطَفَيْنَٰهُ فِى ٱلدُّنْيَا ۖ وَإِنَّهُۥ فِى ٱلْـَٔاخِرَةِ لَمِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿١٣٠﴾ إِذْ قَالَ لَهُۥ رَبُّهُۥٓ أَسْلِمْ ۖ قَالَ أَسْلَمْتُ لِرَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٣١﴾ وَوَصَّىٰ بِهَآ إِبْرَٰهِـۧمُ بَنِيهِ وَيَعْقُوبُ يَٰبَنِىَّ إِنَّ ٱللَّهَ ٱصْطَفَىٰ لَكُمُ ٱلدِّينَ فَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ ﴿١٣٢﴾ أَمْ كُنتُمْ شُهَدَآءَ إِذْ حَضَرَ يَعْقُوبَ ٱلْمَوْتُ إِذْ قَالَ لِبَنِيهِ مَا تَعْبُدُونَ مِنۢ بَعْدِى قَالُوا۟ نَعْبُدُ إِلَٰهَكَ وَإِلَٰهَ ءَابَآئِكَ إِبْرَٰهِـۧمَ وَإِسْمَٰعِيلَ وَإِسْحَٰقَ إِلَٰهًا وَٰحِدًا وَنَحْنُ لَهُۥ مُسْلِمُونَ ﴿١٣٣﴾ تِلْكَ أُمَّةٌ قَدْ خَلَتْ ۖ لَهَا مَا كَسَبَتْ وَلَكُم مَّا كَسَبْتُمْ ۖ وَلَا تُسْـَٔلُونَ عَمَّا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿١٣٤﴾ ﴾

## مانـای وشـە بە وشـەی ئـایەتەکـان

((وە ئایا کێ لە ئایینی ئیبراهیم ڕازی نابێت، مەگەر بابایەك خۆی نەفام کردبێ؟ وە بێگومان ئێمە لە دنیادا هەڵمانبژاردوە، وە لە دواڕۆژیشدا لە چاکانە ﴿١٣٠﴾ یادبکەوە کاتێك پەروەردگاری پێی فەرموو: (واتە: بە ئیبراهیمی فەرموو) گەردن کەچبە، گوتی: گەردن کەچم بۆ پەروەردگاری جیهانەکان ﴿١٣١﴾ وە ئیبراهیم و یەعقووبیش ڕۆڵەکانی خۆیانیان پێ ڕاسپاردو گوتیان: ڕۆڵەکانم ! بەڕاستی خوا بەرنامەی بۆ پەسەند کردوون، دەجا بە مسوڵمانەتیی نەبێ مەمرن ﴿١٣٢﴾ یان ئایا ئێوە لەوێ بوون، کاتێ یەعقووب کاتی مردنی هات، کە بە ڕۆڵەکانی خۆی گوت: ئایا دوای من چی دەپەرستن؟ گوتیان: پەرستراوی تۆو پەرستراوی باب و باپیرانت، ئیبراهیم و ئیسماعیل و ئیسحاق، یەك پەرستراو ئێمەش بۆی ملکەچین ! ﴿١٣٣﴾ جا ئەوە کۆمەڵێکە ڕابردوە، هەرچی بەرهەمی هێنابێ هی خۆیەتی، وە ئێوەش هەرچی بەرهەمی بێنن هی خۆتانەو، لەبارەی ئەوەوە کە کردوویانە، پرسیارتان لێ ناکرێ ﴿١٣٤﴾ )).

## شیکردنەوەی هەندێك لە وشەکان

**(يَرْغَبُ)**: (أَصْلُ الرَّغْبَةِ: السَّعةُ في الشَّيء، يُقَالُ رَغُبَ الشَّيءُ: اتَّسَعَ)، واتە: ئەسڵی (الرَّغْبَةِ) لە فراوانیی لە شتێکدا هاتوە، کە دەگوترێ (رَغِبْتُ في الشيء)، واتە: ئەو شتەم پێخۆشبوو زۆر بە فراوانیی ئارەزووم لێی بووە، وەك دەگوترێ: (رَغُبَ الشَّيءُ)، واتە: ئەو شتە فراوان بوو، وە دەگوترێ (رَغِبْتُ فيهِ) واتە: ئارەزووم بۆی چوو بەڵام ئەگەر بگوترێ، (رَغِبْتُ عَنْهُ)، واتە: ئارەزووم بۆی نەچوو.

**(سَفِهَ نَفْسَهُ)**: (السَّفَهُ: خِفَّةٌ في البَدَنِ وَاستعْمِلَ في خِفَّةِ النَّفْسِ لِنُقْصانِ العَقْلِ) واتە: (خِفَّةٌ) سووکییە لە جەستەدا، وە بەکارهێنراوە بۆ عەقڵ

سووکیی یانی: گێلیی‌و نەفامیی، کەواتە (سَفِهَ نَفْسَهُ)، واتە: عەقڵی خۆی سووك کرد، یان خۆی عەقڵ سووك کرد، یان خۆی گێل کرد.

(اَصْطَفَيْنَهُ)؛ واتە: هەڵمانبژاردوە، (أَصْلُ الصَفَاء: خلُوصُ الشَّيءِ مِنْ الشَوبِ)، (الصَفَاء) ئەوەیە شتێك لە خڵتەو لە جسمێکی نامۆ کە لەگەڵی تێکەڵ بووە لێی جیابکرێتەوە، (والإصطفاء: تَنَاولُ صَفْوِ الشَّيءِ) (إصطفاء) بریتیە لەوەی کە پوختەی شتێك هەڵگری، هەروەك: (الإختيار: تناولُ خَيرهُ)، (الإختيار)، واتە: چاکەکەی هەڵبژێری.

(وَوَصَّىٰ بِهَآ)؛ وە خوێنراویشەتەوە بە: (وَأَوْصَى بِهِ) واتە: وەسیەتی بۆ کرد، جا ئایا وەسیەت چییە؟ (الوَصِيَّةُ: التَّقَدُّمُ إلى الغَيْرِ بِمَا يَعْمَلُ بِهِ مُقْتَرِناً بِوَعْظٍ) (الوَصِيَّةُ): بریتیە لەوەی تۆ بەشێوەی ئامۆژگاریی بە کەسێك بڵێی وابکەو وامەکە، لە ئەسڵدا لەوەوە هاتوە، (أرضٌ واصِيَةٌ: مُتَّصِلَةُ النَّبَاتِ)، واتە: بەردەوام سەوزایی‌و ڕووەکی لێ بڕوێ.

(شُهَدَآءَ)؛ (الشهودُ والشهادَةُ: الحُضُورُ مَعَ المُشَاهَدَةِ، إمَّا بالبَصَرِ، أو بالبَصِيرَةِ)، واتە: (شهِدَ) بەمانای (حَضَرَ) دێت، واتە: ئامادەبوو، وە بەمانای (شهدَ عَلَيهِ) واتە: شایەدیی لەسەردا، کەواتە (شهدَآء)، واتە: ئامادەبووان، یاخود ئەوانەی کە شایەدییان داوە، (شهود)یش بریتیە لە ئامادەبوون لەگەڵ بینیندا، یان بە چاو بیبینی، یان بە عەقڵ‌و بەهۆش ئاگات لێیبێ.

(أُمَّةٌ)؛ (الأُمَّة: كُلّ جَمَاعَة يَجْمَعُهُم أمرٌ مَا إمَّا دينٌ وَاحد، أو زمَانٌ واحد، أو مَكَانٌ واحد)، واتە: (أُمَّة) هەر کۆمەڵە خەڵکێکە کە کارێك کۆیان بکاتەوە، یان یەك دین کۆیان بکاتەوە، یاخود لە کاتێکدا، یان لە شوێنیکدا کۆببنەوە بۆ مەبەستێ.

(خَلَتْ)؛ دەڵێ: (خَلاَ الزَمَان: أي مَضَى وَذَهَبَ)، واتە: کاتەکە تێپەڕی.

(كَسَبَتْ)؛ (الكَسْبُ: مَا يَتَحَرَّاهُ الإنْسَانُ مِما فيهِ اجْتِلابُ نَفْعٍ، وَتَحْصِيلُ حَظٍّ، كَكَسْبِ المَالِ) واتە: (كسب) بریتیە لەو شتەی کە ئینسان مشووری لێ

بخواتو پەیدای بکات، تاکو سوودێکی پێوە وەدەست بێنێ، یاخود تێیدا بە ئاواتێك بگات، وەك (مالّ وەدەستهێنان)، (كَسَبَ) واتە: وەدەستی هێنا، بەرهەمی هێنا.

## هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتەکان

هۆی هاتنەخوارەوەی ئەو ڕستە قورئانییەی کە دەفەرمویّ: ﴿ أَمۡ كُنتُمۡ شُهَدَآءَ إِذۡ حَضَرَ يَعۡقُوبَ ٱلۡمَوۡتُ إِذۡ قَالَ لِبَنِيهِ مَا تَعۡبُدُونَ مِنۢ بَعۡدِي قَالُواْ نَعۡبُدُ إِلَٰهَكَ وَإِلَٰهَ ءَابَآئِكَ إِبۡرَٰهِـۧمَ وَإِسۡمَٰعِيلَ وَإِسۡحَٰقَ إِلَٰهٗا وَٰحِدٗا وَنَحۡنُ لَهُۥ مُسۡلِمُونَ ﴾، {(قَالَ ابْنُ عَبَّاس (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) نَزَلَتْ في اليَهُود حَيْث قَالوا لِلنَّبيّ ﷺ ألَست تعلَم أنَّ يَعقُوب يَوم مَات أوصَى بنِيهِ باليَهُوديَة؟) (أسباب النزول لِلنيسابوري)، واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس خوا لێیان ڕازی بێ، دەڵێ: دەربارەی جوولەکەکان هاتۆتەخوارێ هاتنە خزمەت پێغەمبەر ﷺ گوتیان: ئەی موحەممەد ﷺ تۆ نازانی کە یەعقووب لەکاتی سەرەمەرگدا ئامۆژگاریی ڕۆڵەو نەوەکانی خۆی کردوە، کە هەر لەسەر جوولەکەیەتی بمێننەوە؟! خواش ﷻ بەدرۆی خستنەوە، وەك دوایی لە مانای گشتی ئایەتەکان باسی دەکەین.

## مانای گشتی ئایەتەکان

خوا ﷻ لە ئایەتەکانی پێشوودا وەك لە دەرسی پێشوودا باسمان کرد، باسی ئیبراهیمی کرد ﵇ کە چۆن خوا تاقی کردۆتەوەو لە هەموو تاقیکردنەوەکانی خوا دەرچووەو، شایستەی ئەوە بووە کە بیکاتە پێشەواو سەرمەشق بۆ ئەوە دینداریی‌و بەندایەتیی فێری خەڵکی بکات، وە پاشان کە چۆن کەعبەی ماڵی خوای بینا کرد، کاتێ خوای پەروەردگار پێی فەرموو: (کەعبە) بینا بکەو، لەگەڵ ئیسماعیلی کوڕیدا دروستی کردو، پاشان چەند پاڕانەوەیەکیان کرد، جا دوای ئەوە خوا وەك داکۆکیی کردن لەسەر ڕاستو دروستیی ئیبراهیم کە پێغەمبەری

خاتەم لەسەریەتی فەرمووی: ﴿ وَمَن يَرْغَبُ عَن مِّلَّةِ إِبْرَٰهِـۧمَ إِلَّا مَن سَفِهَ نَفْسَهُۥ ﴾، کێ ئارەزوومەند نابێت بۆ شوێنکەوتنی ئایین و ڕێبازی ئیبراهیم، مەگەر کەسێك کە خۆی نەفام کردبێ و خۆی عەقڵ سووك کردبێ، یان خۆی گێل کردبێ، یاخود خۆی فەوتاندبێ، چونکە هەندێك دەڵێن: ﴿ سَفِهَ نَفْسَهُۥ ﴾ (أي: أهْلَكَهَا) خۆی فەوتاندبێ، ﴿ وَلَقَدِ ٱصْطَفَيْنَٰهُ فِى ٱلدُّنْيَا ۖ وَإِنَّهُۥ فِى ٱلْـَٔاخِرَةِ لَمِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴾، بێگومان ئێمە لە دنیادا وەك گوڵبژێرێك هەڵمانبژاردووە لە دواڕۆژیشدا لە چاکانە، واتە: لە دواڕۆژیشدا لەو پلەوپایە بەرزە دایە، کە خوا ﷻ تەنیا بۆ بەندە چاکەکانی تەرخان کردووە، لێرەدا خوا ﷻ بە پلەی یەکەم جوولەکەکان و نەصرانیی یەکان و خاوەن کتێبەکان دەدوێنێ، وە دوای ئەوانیش هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان، کە: ئێوە لاف ئەوە لێدەدەن بە دوای ئیبراهیم کەوتوون، چونکە بۆ زانیارییتان هەموو خاوەن کتێبەکان و هەموو خاوەن بەرنامە ئاسمانییەکان شانازیی بەوەوە دەکەن کە خۆیان بە شوێن کەوتووی ئیبراهیم دەزانن، وە ئیبراهیم ﷺ خاڵی هاوبەشی نێوان هەموو خاوەن کتێب و خاوەن بەرنامە ئاسمانییەکانە، جا خوا ﷻ دەفەرموێ: مەگەر کەسێك خۆی عەقڵ سووك کردبێ و خۆی گێل کردبێ، ئەگەرنا چۆن بەدوای ڕێبازو دینی ئیبراهیم ناکەوێ ﷺ، کە خوای پەروەردگار لە دنیاو لە دواڕۆژدا هەڵیبژاردووە، بەڵام ئەی جوولەکەکان ! ئەوەتا ئێوە جوولەکایەتییتان گرتووەو بەریناداەن، وە ئەی نەصرانیی یەکان ! ئێوە نەصرانییەتتان گرتووەو بەرینادەن، وە ئەی هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان ! ئێوەش هەر لەسەر شیرك و بتپەرستیین و وازی لێ ناهێنن، بەڵام ئەوەی بەڕاستی بە دوای ئیبراهیم دەکەوێ و ڕێبازو بەرنامەی ئیبراهیمی گرتۆتە پێش، موحەممەد ﷺ و شوێنکەوتووانی ئەون، ئێوەش ئەگەر دەتانەوێ بە نەفام و گێل لەقەڵەم نەدرێن، ئەوە لەگەڵ پێغەمبەری کۆتایی و ئەوانەی لەگەڵیدان بە ڕێبازی ئیبراهیمدا برۆن، ئنجا خوا ﷻ هەڵوێستێکی ئیبراهیم دەگێڕێتەوە، دەفەرموێ: ﴿ إِذْ قَالَ لَهُۥ رَبُّهُۥٓ أَسْلِمْ ۖ قَالَ أَسْلَمْتُ لِرَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾، کاتێك پەروەردگاری پێی فەرموو: گەردن کەچبە ! گوتی: گەردنکەچ بووم بۆ پەروەردگاری جیهانەکان.

لێرەدا خوا ﷻ بە شێوەیەکی گشتی باسی ئەوە دەکات کە ئیبراهیم ﷺ کاتێ خوا پێی فەرمووە: گەردنکەچو ملکەچبە! یەکسەر گوتوویەتی: ئەوە گەردن کەچم، واتە: تۆ ئەگەر تەماشای ژیانی ئیبراهیم ﷺ بکەیو تەماشای هەڵوێستەکانی بکەی، جگە لە مسوڵمانەتییو گەردنکەچییو ملکەچیی بۆ خوا، شتێکی دیکەی تێدا نابینیو، ئەوەی کە فەرموویەتی، بە حەقیقەت لەمیانەی هەڵوێستەکانیدا بەرجەستەی کردوە، چونکە زۆر کەس دەڵێ: مسوڵمانمو بۆ خوا ملکەچم، بەڵام کردەوەکەی قسەکەی هەڵدەوەشێنێتەوە، بەڵام ئیبراهیم ﷺ کاتێ گوتوویەتی: بۆ خوا گەردنکەچم، کاتێك تەماشای ژیانەکەی دەکەی هەموو هەڵوێستەکانی بەڵگەو شایەدن لەسەر ئەوەی کە قسەکەی ڕاستەو هەرئەوەشە مسوڵمانەتیی بەڕاستیو بۆ خوا گەردنکەچبوونی ڕاستەقینە، کە تۆ بە کردەوە بۆ خوا گەردنکەچبی، وە ئەوەی کە بەقسە دەیڵێی بەکردەوە ئیسپاتی بکەی، نەك کردەوەکانت پێچەوانەی قسەکانت بن. ﴿ وَوَصَّىٰ بِهَآ إِبْرَٰهِـۧمُ بَنِيهِ وَيَعْقُوبُ ﴾،

ڕاناوی (بِهَآ) بۆ میللەت دەچێتەوە، واتە: ئیبراهیمو یەعقووب وەسیەتی ڕۆڵەو نەوەکانی خۆیان بە گرتنی ئەو میللەتەو ئەو ئایینو ڕێبازە کرد، هەڵبەتە مەرج نیە ﴿ بَنِيهِ ﴾، تەنیا کوڕان بگرێتەوە، بەڵکو ئەوە پێی دەگوترێ: (تغليب الذكور علَى الإناث) لە زمانی عەرەبیدا کاتێك ئافرەتانو پیاوان پێکەوە باس دەکرێن، وشەیەك بەکاردێ کە هەردووکیان دەگرێتەوە، بەڵام بە ڕواڵەت زیاتر ڕووی لە پیاوانە، واتە ئیبراهیم ڕۆڵەو نەوەکانی ڕاسپاردوەو یەعقووبیش، کە لەسەر ئەو دینو ڕێبازە بڕۆن، جا ئایا وەسیەتەکەیان چۆن بوو؟ ﴿ يَـٰبَنِىَّ إِنَّ ٱللَّهَ ٱصْطَفَىٰ لَكُمُ ٱلدِّينَ فَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ ﴾، هەردووکیان گوتیان: {ئیبراهیم وایگوت کە بابی ئیسماعیلو ئیسحاقە، وە یەعقووبیش وایگوت کە کوڕی ئیسحاقەو نەوەی (ئیبراهیم)ە، وە یەعقووب دوازدە کوڕی بوو ون یوسفو بنیامینو دە برای دیکەشیان بوو ون، یوسفو بنیامین لە دایکێك بوون، ئەوانی دیکەش لە دایکێکی دیکەبوون، هەر کام لە ئیبراهیمو لە یەعقووب گوتیان}

﴿ يَـٰبَنِىَّ إِنَّ ٱللَّهَ ٱصْطَفَىٰ لَكُمُ ٱلدِّينَ ﴾، ئەی ڕۆڵەکانم! خوا بەرنامەیەکی بۆ

هەڵبژاردوون بەرنامەیەکی بۆ پەسەند کردوون، کە بریتیە لەچی؟ ﴿ فَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ ﴾، بە مسوڵمانەتیی نەبێ مەمرن، واتە: با ژیانتان هەمووی ئیسلامەتیی بێ بۆ خوا، تاکو مردنەکەشتان لەسەر ئیسلام بێ، چونکە ئینسان لەسەر چ بژیێ لەسەر ئەوەش دەمرێ، جا کە لێرەدا دەفەرموێ: بە مسوڵمانەتیی نەبێ مەمرن، دیارە مرۆڤ لەکاتی مردندا ئیرادەو ئیختیاری نیە، بەڵام هەرکەس بە مسوڵمانەتیی ژیا، بە مسوڵمانەتییش دەمرێ‌و ئینسان لەسەر چ بژیێ لەسەر ئەوەش دەمرێ، کەواتە: ئەوە ئامۆژگارییە بەوە کە ئێوە بە مسوڵمانەتیی بژین‌و هەمیشە گەردنکەچ بن بۆ خوا، بۆ ئەوەی هەرکات مەرگ‌و مردنتان گەیشتە سەر، لەسەر ئەوە بمرن کە لەسەری ژیاون، کە ئیسلام‌و گەردن کەچییە بۆ خواو، پابەندبوونە بە شەریعەتی خوای پەروەردگارەوە، ئنجا خوای بێ وێنە ﷻ ڕوو لە جوولەکەکان دەکات {وەك لە هۆی هاتنەخوارەوەکەی باسمان کرد، کە لافی ئەوەیان لێدەدا کە کاتی خۆی یەعقووب - سەلامی خوای لەسەربێ - لەکاتی سەرەمەرگدا وەسیەتی کردوە بۆ نەوەکانی کە بەدوای یەهودییەت بکەون}، ئیدی خوا ﷻ بەدرۆیان دەخاتەوەو دەفەرموێ: ﴿ أَمْ كُنتُمْ شُهَدَآءَ إِذْ حَضَرَ يَعْقُوبَ ٱلْمَوْتُ ﴾، یان ئایا ئێوە لەوێ بوون ئەی ئەو جوولەکانەی ڕۆژگاری پێغەمبەر ﷺ، یان هی ئێستاش، ئەگەر هەمان ئیددیعایان هەبێت، ئایا ئەو کاتە کە یەعقووب لە حاڵەتی سەرەمەرگ دابوو، ئێوە لەلای بوون؟ واتە: خۆ ئێوە لەوێ لەلای نەبوون ئەدی ئەو ئیددیعایەتان لە کوێ هێنا؟ بەڵێ ئەوە تەنیا خوایە ﷻ کە ئاگای لەو کاتیش بووەو، ئاگای لە ئێستاش هەیەو، ئەوە هەواڵتان پێدەدا، کە یەعقووب چی گوتوە، ئایا وەسیەتی یەعقووب وەك ئێوە ئیددیعا دەکەن ئەوەبووە، کە گوتوویەتی: هەر لەسەر یەهودییەت بمێننەوە، یان بە پێچەوانەوە وەسیەتەکەی شتێکی دی بووە، کە بەتەئکید شتێکی دیکە بووە، ئەویش ئەوەیە کە دەفەرموێ: ﴿ إِذْ قَالَ لِبَنِيهِ مَا تَعْبُدُونَ مِنۢ بَعْدِى ﴾، بە شێوەی پرسیار لە ڕۆڵەکانی پرسی: لە دوای من چ شتێك دەپەرستن؟! ﴿ قَالُواْ نَعْبُدُ إِلَـٰهَكَ وَإِلَـٰهَ ءَابَآئِكَ إِبْرَٰهِـۧمَ وَإِسْمَـٰعِيلَ وَإِسْحَـٰقَ إِلَـٰهًا وَٰحِدًا

﴿ وَنَحْنُ لَهُۥ مُسْلِمُونَ ﴾، (کاتێك یەعقووب ئەو پرسیارە ئاڕاستەی ڕۆڵەکانی دەکاتو دەفەرموێ لە دوای من چی دەپەرستن؟ بەتەمان بەدوای چ دینو ڕێبازێك بکەون؟) گوتیان: تەنیا پەرستراوی تۆ دەپەرستین ئەو پەرستراوەی کە تۆ پەرستووتە، (إله) بەمانای (پەرستراوە) خوا یەکێکە، بەڵام پەرستراو زۆرن، پەرستراوی بە هەق تەنیا خوایە، بەڵام پەرستراوی بەناهەقیش هەن، هەر لە هەواو ئارەزووەوە بگرە، تا دارو بەردو بتو سەنەمو خڕۆکەو مانگو ئەستێرەو طاغووتو حیزبو دەوڵەتو هەر شتێك بەو شێوەیە مامەڵەی لەگەڵ، کرا کە بەرزترین شتو گەورەترین شت بەڕێزترین شت بێو لە هەموو شت زیاتر بۆی ملکەچ بیو بەدوای بکەوی، ئەوە پەرستراوە جا ڕۆڵەکانی وەڵام دەدەنەوەو دەڵێن: ئێمە پەرستراوی تۆ دەپەرستینو پەرستراوی بابو باپیرانی تۆ: ئیبراهیم (کە باپیریەتی)و ئیسماعیل (کە مامیەتی)و ئیسحاق (کە بابیەتی) جا ئایا ئەو پەرستراو (إلە)ە چەندن؟ ﴿ إِلَٰهًا وَٰحِدًا ﴾، یەك پەرستراو ﴿ وَنَحْنُ لَهُۥ مُسْلِمُونَ ﴾، وە ئێمە بۆ ئەو ملکەچو گەردنکەچین، کەواتە: ئەوە وەسیەتی یەعقووب بووە بۆ کوڕەکانیو کاتێك کە پرسیاری لێکردوون، ئاوا وەڵامیان داوەتەوە، دیارە ئەویش وەڵامەکەی زۆر پێ خۆشبووەو ئەوە دوایین قسەی نێوان یەعقووبو ڕۆڵەکانی بووە، ئەی کەواتە: جوولەکەکان! ئێوە ڕاست ناکەن کە گوایە یەعقووب وەسیەتی بۆ ڕۆڵەکانی کردوە: پابەندبن بە جوولەکایەتییەوە، لە کۆتاییدا خوا دەفەرموێ ﴿ تِلْكَ أُمَّةٌ قَدْ خَلَتْ ﴾، ئەوانە کۆمەڵێك بوون ڕابردنو تێپەڕین ﴿ لَهَا مَا كَسَبَتْ ﴾، هەرچی کردوویانەو وەدەستیان هێناوە، لە کردەوەی چاك یان خراپ، ئەوە ئەوان خاوەنی کردەوەکانی خۆیانن ﴿ وَلَكُم مَّا كَسَبْتُمْ ﴾، وە ئێوەش هەر کردەوەیەك بەدەست بێنن چاك بێ یان خراپ، ئێوەش دەبن بە خاوەنی کردەوەکانی خۆتان ﴿ وَلَا تُسْـَٔلُونَ عَمَّا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴾، ئێوە دەربارەی کردەوەکانی ئەوان کە ئەنجامیان داون لێتان ناپرسرێتەوە، هەر وەك ئەوانیش دەربارەی ئێوە پرسیاریان لێ ناکرێ، وەك کوردەواریی خۆمان دەڵێ ((نان ئەو نانە ئەمڕۆ لە خوانە)) مەچن شانازیی مەکەنو خۆ هەڵمەکێشن کە ئێمە لەسەر ڕێبازی (ئیبراهیم)ین، کە

ڕاستیش ناکەن، یان ئێمە نەوەو وەچەی (ئیسحاق و یەعقووب)ین، شانازیی بەوانەوە مەکەن، چونکە ئەوان کردەوە چاکەکانی خۆیان هی خۆیانەو ئێوەش کردەوەی خراپی خۆتان، هی خۆتانە، ئازابن ئێوەش کردەوەی باش بکەن وەك ئەوان، ئەگەرنا کردەوەی چاکی ئەوان دادی ئێوە نادات.

## چەند مەسەلەیەکی گرنگ

**مەسەلەی یەکەم:** ئیبراهیم ﷺ خاڵی هاوبەشی نێوان هەموو خاوەن کتێبەکانە، وە هەموو خاوەن بەرنامە ئاسمانییەکان، لەسەری یەك دەنگن، بەلام پێغەمبەرانی دیکە (علیهم الصلاة والسلام) مەرج نیە هەموویان لەسەریان یەك دەنگ بن، هەڵبەتە ئەهلی ئیسلام دان بە هەموو پێغەمبەراندا دێنن ﴿...لَا نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِّن رُّسُلِهِۦ... ﴿٢٨٥﴾﴾البقرة، بەلام ئیبراهیم هیچ کەس ڕا جیایی لەسەری نەبووە، بۆیە خوا ﷻ لە قورئاندا زۆر باسی ئیبراهیمی کردوە، وە بەڕاستی ئیبراهیم لە سەردەمی خۆیدا لەگەڵ هەموو ئەوانەی نەیاربوون بە بەرنامەو ڕێبازی خوا، لەگەڵ هەموویان تێکگیراوە، لەگەڵ نەمروودا تێکگیراوە، کە گوتوویەتی: ﴿... أَنَا۠ أُحۡيِۦ وَأُمِيتُ ...﴿٢٥٨﴾﴾البقرة، من دەمرێنم و دەژیەنم، طاغووتێك بووە خۆی بە پەرستراوی خەڵك زانیوە، هەروەها لەگەڵ ئەستێرە پەرستان تێکگیراوەو، لەگەڵ خۆر پەرستانو، لەگەڵ مانگ پەرستانو، لەگەڵ بتپەرستان، لەگەڵ هەموو ئەوانەدا کە غەیری خوایان پەرستوەو لەگەڵ هەموو ئەوانەدا کە بەرێی غەیری خوادا ڕۆیشتوون، تێکگیراوە، بۆیەش ئیبراهیم ﷺ شایستەیی پێشەوایەتی خەڵکی بە گشتی هەبووە، چونکە بەڵگەی لەسەر خەڵکی ڕۆژگاری خۆی تەواوکردوە، پاشان ئیبراهیم هەر لە شوێنێکدا دانەنیشتوە، سەرەتا لە عێراق بووە، پاشان چۆتە شام، ئنجا چۆتە میسر، دوایی چۆتە حیجاز، یانی ئەو شوێنانەی کە پێشتر بەشەریەتی زۆر لێبووە، دەوری ڕووبارەکانی نیل و دیجلەو فوراتو ئەوانە، ئیبراهیم ﷺ لەنێو ئەو هەموو خەڵکەدا ژیاوەو بەڵگەی ئایینی خوای لەسەر تەواوکردوون .

**مەسەلەی دووەم:** گەردنکەچیی کاکڵەی بەندایەتییە، وەك ئەم ڕستە قورئانییە دەیگەیەنێ: ﴿ إِذْ قَالَ لَهُۥ رَبُّهُۥٓ أَسْلِمْ ۖ قَالَ أَسْلَمْتُ لِرَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾، یادبکەوە کاتێك پەروەرگاری پێی فەرموو: گەردنکەچبە، گوتی: گەردنکەچم بۆ پەروەردگاری جیهانەکان، گەردنکەچیی بۆ خوای پەروەردگار کاکڵەی بەندایەتی بۆ خواو کاکڵەی مسوڵمانەتیی و کاکڵەی ئیمانە بۆچی؟ چونکە ئەگەر ئینسان بەڕاستی ئیمانی هەبێ، دەبێ بەڕاستی بۆ خوا ملکەچبێ و، بەڕاستی بە دوای پێغەمبەری خوا بکەوێ ﷺ، بۆیەش بەدوای پێغەمبەری خوا دەکەوێ، چونکە ئەو پێغەمبەرە ﷺ بەڕێی خوادا دەیبات و بۆ ئەوەی کە ملی پێ کەچبکا بۆ خوا ﷻ، ئنجا دیارە ملکەچیی بۆ خوا بەس قسەیەك نیە بەدەم بگوترێ، بەڵکو کردەوەیەکە دەبێ لە ژیانی ئینساندا ڕەنگ بداتەوە لە سەرجەم بوارەکانی ژیانیدا، چ لەبواری دروشمەکانداو چ لە بەرنامەکاندا، چ لە ژیانی تاکییداو، چ لە ژیانی کۆمەڵییداو، چ لە ژیانی سیاسیداو، چ لە ڕووی مەعنەوییو، چ لە ڕووی ماددیی، دەبێ بەندایەتییت بۆ خواو ملکەچییت بۆ خوا، لە خۆتدا بەرجەستە بکەی، ئەوجار مسوڵمانیو ملکەچی بۆ خوا.

**مەسەلەی سێیەم:** کە هەرکام لە ئیبراهیم و یەعقووب (علیهما الصلاة والسلام) ئامۆژگاریی و وەسیەت دەکەن بۆ ڕۆڵەو نەوەکانی خۆیان، ئەوەی لێوەردەگیرێ کە ئینسان دەبێ هەمیشە وەسیەت و ئامۆژگاریی بکات بۆ دەوروبەری خۆی و نزیکانی خۆی، بەوە کە لە بەرنامەی خوای پەروەردگار لانەدەن، واتە: ئەگەر ئینسان تاکە وەسیەتێکی هەبێ دەبێت، ئەوەبێ کە وەسیەت بکات بۆ نزیکانی خۆی، کە ملکەچبن بۆ خواو پابەندبن بە شەریعەتی خواوە، بەڕاستی ئەوە گەورەترین وەسیەتە، چونکە مایەی بەختەوەریی و سەربەرزیی دنیاو دواڕۆژە.

**مەسەلەی چوارەم:** بەرنامەی هەڵبژێردراوی خوا چییە؟ بێگومان ئیسلام ئەو دینەیە کە خوا هەڵیبژاردوە بۆ ڕۆڵەو بۆ نەوەکانی ئیبراهیم و ئیسماعیل و ئیسحاق و یەعقووب (علیهم الصلاة والسلام)، بەڵام نەك تەنیا بۆ ئەوان، بەڵکو ئیسلام بەرنامەی هەڵبژێردراوی خوایە بۆ هەموو بەشەرییەتیش، وەك

دەفـــــەرموێ: ﴿ ...ٱلْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلْإِسْلَٰمَ دِينًا ...﴿٣﴾ ﴾آل عمران، ئەمڕۆ ئایینەکەتانم بۆ تەواوکردنو ئیسلامم بە بەرنامە بۆ پەسەند کردنو چاکەی خۆمم بەتەواویی لەگەڵتان کرد، لەڕاستیدا تاکە بەرنامەیەك کە لەلای خوا هەڵبژێردراوو پەسند کراوبێ، بریتیە لە ئیسلام، واتە: خوای پەروەردگار بە غەیری ئیسلام ڕازی نیە بکرێتە بەرنامەی ژیان، غەیری ئیسلامیش هەموو ئەو ڕێچکانە دەگرێتەوە، کە لە ڕۆژهەڵاتو ڕۆژئاواو لەنێوخۆدا پەیدابوو ونو پەیدا دەکرێن.

**مەسەلەی پێنجەم:** کە خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ إِذْ حَضَرَ يَعْقُوبَ ٱلْمَوْتُ ﴾، کاتێك کە مردن گەیشتە سەر یەعقووب، مەبەست پێی حاڵەتی سەرەمەرگ نیە، چونکە لە سەرەمەرگدا ئینسان وەسیەتی بۆ ناکرێ، واتە: کە نیشانەکانی مردنی لێ وەدەرکەوتنو هۆکارەکانی مردنی لێوە نزیك کەوتن.

**مەسەلەی شەشەم:** مرۆڤ دەبێ خۆی هەبێ، نەك بەتەمای چاکیی بابو باپیرانو پێشینانی لێبگەڕێ، ئەگەر کەسێك بۆ خۆی خاڵیبێ لەو سیفەتە چاکانەی کە لەواندا هەبوون، ئەوە وەك دەڵێ: (کە خۆت کۆسەی ڕیشی بابت بەتۆ چی !)، یان (کەس بە مەلەی بابی ناپەڕێتەوە)، تۆ دەبێ تۆ خۆت مشووری کردەوەی چاك بخۆی، ئەگەر بابت کردەوەی باشی بووە، پێشینانت کردەوەی باشیان بووە، بە تایبەتی کوڕە مەلاو کوڕە سەیدو کوڕە شێخو ئەوانە ... زۆر جار بەتەمای ئەوە لێ دەگەڕێن کە بابی شێخ بووە، بابی پیاوی چاك بووە، یان بابی فلان کەس بووە .. لە ڕاستیدا (کەس بە مەلەی بابی ناپەڕێتەوە)، بەتایبەتی بۆ هەڵسوکەوتو مامەڵە لەگەڵ خوداو بۆ قیامەت، هەر کەس دەبێ بۆ خۆی کردەوەی باش بکات، ئنجا بەختەوەرو سەرفراز دەبێت، ئەگەرنا: کەس بە خەیاڵ نەبووە بە ماڵ !.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی بیست و هەشتەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان لە ئایەتی (١٣٥ هەتاکو ١٤١)، واتە حەوت (٧) ئایەت دەگرێتە خۆی، کە دەکاتە کۆتایی جوزئی یەکەم لە قورئانی بەپێز، لەم حەوت ئایەتەدا خوا ﷻ دێتە سەر بەرپەرچدانەوەی هەندێ لە قسەو قاڵی جوولەکەو نەصرانیی یەکان، کە داوایان لە مسوڵمانان کردوە ببنە جوولەکە، یان ببنە نەصرانیی، بۆ ئەوەی ڕێگای ڕاست بگرن !، خوا ﷻ بە پێغەمبەری خۆی ﷺ دەفەرموێ، وە بە مسوڵمانان دەفەرموێ: ئێوە شێوەی ئیمانداریی‌و دینداریی‌و مسوڵمانەتی خۆتانیان بۆ بخەنەڕوو وە پێیان ڕابگەیەنن، کە ئێوە بۆ خوا گەردنکەچ‌و مسوڵمانن، وە دوایی دەفەرموێ: ئەگەر ئەوانیش بەوەی کە ئێوە ئیمانتان پێ هێناوە، بەو شێوەیە ئیمانیان هێنا، ئەوە ڕێگای ڕاستیان گرتوە، ئەگەرنا ئەوانە لە دووبەرەکییدان لەگەڵ خوادا ﷻ، ئنجا دوایی خوا باسی ئەوە دەکات کە ئەوە ڕەنگی خوایە کە بەندەکانی خۆی پێ ڕەنگ دەکا، وە دوایی چەند قسەو پڕوپاگەندەیەکی دیکەی جوولەکەو نەصرانیی یەکان بەرپەرچ دەداتەوە، وە بە بەڵگەی زۆر بەهێز دەمکوتیان دەکات.

﴿وَقَالُوا كُونُوا هُودًا أَوْ نَصَارَىٰ تَهْتَدُوا ۗ قُلْ بَلْ مِلَّةَ إِبْرَاهِيمَ حَنِيفًا ۖ وَمَا كَانَ مِنَ الْمُشْرِكِينَ ﴿١٣٥﴾ قُولُوا آمَنَّا بِاللَّهِ وَمَا أُنزِلَ إِلَيْنَا وَمَا أُنزِلَ إِلَىٰ إِبْرَاهِيمَ وَإِسْمَاعِيلَ وَإِسْحَاقَ وَيَعْقُوبَ وَالْأَسْبَاطِ وَمَا أُوتِيَ مُوسَىٰ وَعِيسَىٰ وَمَا أُوتِيَ النَّبِيُّونَ مِن رَّبِّهِمْ لَا نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِّنْهُمْ وَنَحْنُ لَهُ مُسْلِمُونَ ﴿١٣٦﴾ فَإِنْ آمَنُوا بِمِثْلِ مَا آمَنتُم بِهِ فَقَدِ اهْتَدَوا ۖ وَّإِن تَوَلَّوْا فَإِنَّمَا هُمْ فِي شِقَاقٍ ۖ فَسَيَكْفِيكَهُمُ اللَّهُ ۚ وَهُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ ﴿١٣٧﴾ صِبْغَةَ اللَّهِ ۖ وَمَنْ أَحْسَنُ

مِنَ ٱللَّهِ صِبۡغَةً ۖ وَنَحۡنُ لَهُۥ عَٰبِدُونَ ﴿١٣٨﴾ قُلۡ أَتُحَآجُّونَنَا فِي ٱللَّهِ وَهُوَ رَبُّنَا وَرَبُّكُمۡ وَلَنَآ أَعۡمَٰلُنَا وَلَكُمۡ أَعۡمَٰلُكُمۡ وَنَحۡنُ لَهُۥ مُخۡلِصُونَ ﴿١٣٩﴾ أَمۡ تَقُولُونَ إِنَّ إِبۡرَٰهِـۧمَ وَإِسۡمَٰعِيلَ وَإِسۡحَٰقَ وَيَعۡقُوبَ وَٱلۡأَسۡبَاطَ كَانُواْ هُودًا أَوۡ نَصَٰرَىٰ ۗ قُلۡ ءَأَنتُمۡ أَعۡلَمُ أَمِ ٱللَّهُ ۗ وَمَنۡ أَظۡلَمُ مِمَّن كَتَمَ شَهَٰدَةً عِندَهُۥ مِنَ ٱللَّهِ ۗ وَمَا ٱللَّهُ بِغَٰفِلٍ عَمَّا تَعۡمَلُونَ ﴿١٤٠﴾ تِلۡكَ أُمَّةٌ قَدۡ خَلَتۡ ۖ لَهَا مَا كَسَبَتۡ وَلَكُم مَّا كَسَبۡتُمۡ ۖ وَلَا تُسۡـَٔلُونَ عَمَّا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴿١٤١﴾ ﴾.

## مانای وشه به وشەی ئایەتەكان

((وە - هەركام لە جوولەكەو دیانەكان - گوتیان: ببنە جوولەكە یان نەصرانیی ڕێی ڕاست دەگرن بڵێ: بەڵكو ئایینی ئیبراهیم بگرن، كە ئەو پاكو ڕاست بوو، وە لە هاوبەش دانەران نەبوو ﴿١٣٥﴾ بڵێن: بڕوامان بەخوا هێناوەو بەوە كە بۆ لامان نێرراوەتە خوار، وە بەوە كە بۆ لای ئیبراهیمو ئیسماعیلو ئیسحاقو یەعقووبو نەوەكانی نێرراوەتە خوار، وە بەوە كە بە مووساو عیسا دراوەو، بەوە كە بە سەرجەم پێغەمبەران دراوە لە پەروەردگاریانەوە، جیاوازیی ناخەینە نێوان هیچ كامیانەوە، وە ئێمە بۆی ملكەچین ﴿١٣٦﴾ جا ئەگەر ئەوانیش ئیمانیان بە وێنەی ئەوە هێنا كە ئێوە ئیمانتان پێی هێناوە، ئەوە ڕێی ڕاستیان گرتوە، بەڵام ئەگەر پشتیان هەڵكرد، ئەوە بێگومان بەس لە دژایەتیكردن دانو، خواش دەتپارێزێ لێیان، وە ئەو بیسەری زانایە ﴿١٣٧﴾ ڕەنگكردنی خوایە (واتە: ئیسلام) جا ڕەنگكردنی كێ لە هی خوا چاكترە ! وە ئێمە ملكەچو پەرستاری وین ﴿١٣٨﴾ بڵێ: ئایا لەبارەی خواوە (كە گوایە ئێوە لێی نزیكترن !) شەڕە قسەمان لەگەڵ دەكەن لە حاڵێكدا كە ئەو پەروەردگاری ئێمەو پەروەردگاری ئێوەشە، وە ئێمە كردەوەكانی خۆمانمان هەیەو ئێوەش كردەوەكانی خۆتانتان هەیە، وە ئێمە خۆمان بۆی ساغو یەكلاكردۆتەوە ﴿١٣٩﴾ یاخود دەڵێن: كە ئیبراهیمو ئیسماعیلو ئیسحاقو یەعقووبو نەوەكان (ی یەعقووب) جوولەكە، یان نەصرانیی بوونە ! بڵێ: ئایا ئێوە زاناترن

یـان خـوا ؟ وە ئایـا کـێ لەوکەسـە سـتەمکارترە، کـە شـایەدییەکی خـوای لەلایـەو دەیشارێتەوە، وە خوا لەوەی دەیکـەن بێئاگـا نیـە ﴿١٤٠﴾ ئـەوە کۆمـەڵـێکە تێپـەڕیوەو هەرچی بەرهەمی هێنابێ هـی خۆیـەتیو، ئێـوەش هـەرچی بەرهـەمی بێنـن هـی خۆتـانە، وە لەبارەی ئەوەوە کە کردوویانە، پرسـیارتان لێناکـرێ ﴿١٤١﴾)).

## شـیکردنـەوەی هەندێـك لە وشـەکان

(حَنِيفًا): (الحَنَـفُ: هُوَ مَيْـلٌ عَنِ الضَّـلاَلِ إِلـى الإِسـتقَامَةِ، عَكْسُ الجَنَـف: وهُوَ مَيْلٌ عَنِ الإِسـتقَامَةِ إِلـى الضَّلاَل، والحَنَفُ: هُوَ الـمَائِلُ إِلـى ذَلِـكَ). واتـە: (حَنَفُ) بریتیە لە مەیلکردنو بەلاداچوون لە گومڕاییەوە بەرەو ڕاسـتە ڕێگا، بە پێچەوانەوەی (جَنَف)ەوە، وشەی (جَنَف) بریتیە لە مەیلکردنی کەسێك بۆ وازهێنان لە گومڕاییو لەڕێی لارو خـوار بەرەو ڕاسـتە شەقامی خوا.

(ٱلْمُشْرِكِينَ): کۆی (مُشْرِك)ە، (الشِّرْكَةُ وَالـمُشَارَكَةُ: خَلْطُ الـمِلْكَيْنِ) ئەگەر دوو شتان تێکەڵ بکەی پێی دەگوترێ (الشِّرْكَةُ وَالـمُشَارَكَةُ) وە (مُشْرِك)، واتـە: هاوبەش دانەر، هاوبەش بۆ کـێ دادەنێ؟ بۆ خوا ﷻ، لە چیدا ؟ لـە پەرسـتنی، یان لە پەروەردگارێتی، یان لە سیفەتەکانیدا.

دیارە شـیرکیش، دوو جۆرە: شـیرکی گـەورەو شـیرکی گچکە:

١) شیـرکی گەورە بریتیە لە هاوبەش بـۆ خـوا دانـان لـە پەرسـتـراوێتی، یـان لـە بەدیهێنەرایەتی، یان پەروەردگارێتی، یان ناوو سـیفەتەکانیدا.

٢) شیـرکی بـچووك بریتیـە لـەوەی کاتـێ شـتێك بـۆ خـوا ئـەنجام دەدەی، بەشـی غەیری خواشی تێبخەی، بۆ وێنە: ڕیابازیی جۆرێکە لە (شِرك) تـۆ نوێـژێك دەکـەی، تەماشـا دەکـەی خـەڵك دەتبینـێ تۆزێـك ڕکووعەکـەت درێـژتر دەکەیـەوە ! یـان جوانتـر ڕادەوەسـتی بـۆ ئـەوەی بڵـێن: پیـاوێکی بـۆ خـوا ملکەچە، هەرچەندە لە ئەسڵدا شتەکە بۆ خوا دەکەی، بەڵام بەشـی غـەیری خواشت تێخستوە، دیارە هەرکردەوەیـەکی خـواش کـە بەشـی غـەیری خـوای

تێخرا، ئەوە بێگومان خوا وەریناگرێ، وەك لەم فەرموودەیەدا ڕاگەیەنراوە: {مَـنْ عَمِلَ عَمَـلاً أشْـرَكَ فيـه معـي غيـري، تركـتُهُ و شِرْكَه} رواه مسلم من أبي هريرة: (٢٩٨٥)، واتە: خوای پایەبەرز فەرموویەتی: من بێنیازترین دەوڵەمەندم لە هاوبەشێتی، هەرکەسێك کردەوەیەك بکاتو جگە لە منی تێدا بەشدار بکات ئەوە کردەوەکەیو هاوبەشییەکەی واز لێدێنم .

(النووي) لە شەرعی ئەم فەرموودەیەدا گوتوویەتی: (والمراد أنَّ عَمَل الرائي باطِلٌ لا ثوابَ فيه ويأثم به)، بڕوانە: (شرح صحيح مسلم، واتە: مەبەست ئەوەیە کە کردەوەی ڕیاباز پووچەو پاداشتی نیە، بگرە خاوەکەی پێی گوناهباریش دەبێ.

جۆرێکی دیکەی شیرکی گچکەش هەیە کە بریتیە لە بەکارهێنانی هەندێك وشەو تەعبیر، کە جۆرێك لە یەکسانکردنی خوای بەرزومەزنی تێدایە لەگەڵ غەیری خوادا، وەك: سوێند خواردن بە غەیری خوا، وە گوتنی: (ماشاءَ الله وشِئت)، (لولا الله و فلان)...

(وَٱلْأَسْبَاطِ)؛ کۆی (سَبْط)ە، (سَبْط) واتە: نەوە (أصْلُ السَّبْطِ: انْبِسَاطٌ في سُهُولَةٍ، يَقُولُ: شَعْرٌ سَبْطٌ، وَالسِّبْطُ: وَلَدُ الوَلَدِ) بریتیە لەوەی شتێك ئاوا بە ئاسانی درێژ بێتەوە، دەگوترێ (شَعْرٌ سَبْطٌ) موویەکی خاو کە دێتەخوارێ. (سَبْط) یەکسەر پێچەوانەی (جَعْد)ە، کە بەمانای (گرژ)ە، قژی گرژولوول (جَعْد)ی پێ دەڵێن، وە (سِبْط) کوڕە، یان منداڵی منداڵە، جا کوڕبێ یان کچ.

(شِقَاقٍ)؛ لە (شَقّ)ەوە هاتوە، (الشَّقُّ: الخَرْمُ الوَاقِعُ في الشَّيءِ) شتێك کە لەت بکرێ، ئەوە پێی دەگوترێ (شَقّ) (والشِّقَاقُ: المُخَالَفَةُ، وَكَوْنُكَ في شِقٍّ غَيْرِ شِقِّ صَاحِبِكَ) (شِّقَاقُ) بریتیە لە پێچەوانەو دژایەتییکردنو بەربەرەکانێکردن، چونکە تۆ دەچیتە بەرێك غەیری بەری بەرانبەرەکەت.

(فَسَيَكْفِيكَهُمُ ٱللَّهُ)؛ واتە: خوا ئەوانەت لە کۆڵ دەکاتەوە، یان خوای پەروەردگارت بەسە بۆ دژایەتی ئەوان. (الكِفَايَةُ: مَا فِيهِ سد الخَلَّةِ وَبُلُوغُ

الـمُرَادِ فـي الأَمْرِ)، (كِفَايَةُ): ئەوەیە کە کەلێن بگیرێ، وە ئینسان لە شتێکدا بە ئەنجام بگات.

(صِبْغَةَ): (الـصَّبْغُ: مَـصْدَرُ صَبَغْـتُ)، واتـە: بۆیـاغم کـرد، بۆیـەم کـرد، (والـصِّبْغُ: الـمَصْبُوغُ) واتـە: بۆیـەکراو، بۆیاغکـراو، ڕەنگـکراو، کەواتـە: (صِبْغَةَ)، واتـە: ڕەنگ، یان ڕەنگکردن.

(مُخْلِصُونَ): واتە: ئەوانەی خۆیان بـۆ خـوا سـاغ کردۆتـەوە، یـان کردەوەکـەیان بـۆ خـوا ساغ کردۆتەوەو یەکلاکردۆتەوەو بەشـی غەیری خوایان پێوە نەهێشتوە، چـونکە: (الإِخـلاَصُ: التَبَـرِّي عَـنْ كُـلِّ مَـا دُونَ الله) (إِخـلاص) بریتیـە لـە یەکـلابوونەوەو دوورکەوتنـەوە لەهـەر شـتێك كـە غـەیری خوایـە، وەختێـك مرۆڤـ کردەوەیـەك ئـەنجام دەدات، ئەگـەر تـەنیا بـۆ خوابـێ، مانـای وایـە کردەوەکەی خـۆی سـاغ کردۆتـەوە، چونکە (أَخْلَـص)، واتـە: سـاغیی کـردەوەو (خـلاص)ی کرد دەربازی کرد لە خلّـتەوخـالّ.

(أَظْلَمُ): واتە: کـێ سـتەمکارترە. (وَالظُّلْمُ عِنْدَ أَهْـلِ اللُّغَـةِ وَكَـثِيـرٍ مِنَ العُلَمَـاءِ: وَضْـعُ الـشَّـيءِ فـي غَيْـرِ مَوْضِـعِهِ الـمُخْتَصِّ بِـهِ)، واتـە: (ظُلْـم) لـەلای ئـەهلی زمانو زۆربەی زانایان: بریتیە دانانی شتێك لە غەیری ئەو شوێنە کە تایبەتە پێیەوە، جا (ظُلْم) سێ بەشـە:

١) زوڵم لەنێوان خۆمانو خـوادا، وەك: شیـركو کوفـرو نیفـاق، وەك لوقمـان بە کوڕەکەی خۆی گوت: ﴿ وَإِذْ قَالَ لُقْمَٰنُ لِٱبْنِهِۦ وَهُوَ يَعِظُهُۥ يَٰبُنَيَّ لَا تُشْرِكْ بِٱللَّهِ إِنَّ ٱلشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ ﴿١٣﴾ ﴾لقمان، بەڵێ، گەورەترین زوڵم ئەوەیە کە خوا تۆی دروستکردوە کەچی هاوبەشی بۆ پەیدابکەیو غەیری ئەو بپەرستی.

٢) زوڵـم لـەنێوان خۆمـانو خەڵکدا، وەك خـوا دەفـەرموێ: ﴿ إِنَّمَا ٱلسَّبِيلُ عَلَى ٱلَّذِينَ يَظْلِمُونَ ٱلنَّاسَ وَيَبْغُونَ فِي ٱلْأَرْضِ بِغَيْرِ ٱلْحَقِّ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٤٢﴾ ﴾الشورى

٣) زوڵـم لەخۆکـردن، وەك خـوا دەفـەرموێ: ﴿ ... فَمِنْهُمْ ظَالِمٌ لِّنَفْسِهِۦ وَمِنْهُم مُّقْتَصِدٌ وَمِنْهُمْ سَابِقٌۢ بِٱلْخَيْرَٰتِ بِإِذْنِ ٱللَّهِ ۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلْفَضْلُ ٱلْكَبِيرُ ﴿٣٢﴾ ﴾ فاطر، دیارە ستەم لەخۆکردن هەردوو بەشەکانی دیکەش دەگرێتەوەو، هەر گوناهێك بکەی، ستەمت لەخۆت کردوە، چ شیرك بێت، چ مافی خەڵك پێشێل بکەی، چ واجبێکی خوای پەروەردگار بچوێنی، یاخود قەدەغەیەکی بشکێنی، هەمووی بریتیە لە گوناهێك و لە ستەمێك کە بەرانبەر بەخۆت دەیکەی .

## هـۆی هاتنە خـوارەوەی ئایەتەکـان

١ – هۆی هاتنە خوارەوەی ئـەو ڕسـتەیەی کـە دەفـەرموێ: ﴿ وَقَالُوا۟ كُونُوا۟ هُودًا أَوْ نَصَٰرَىٰ تَهْتَدُوا۟ ﴾، {(قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: نَزَلَتْ فِي رؤُس يهُود الـمَدينة وفـي نَصارى نَجـران...) (أسـباب الـنـزول للنيـسابوري، ص (٢٧- ٢٨)}، واتـە: عەبدوڵـلای کوڕی عەبباس دەڵێ: هەندێك لـە سـەرانی جوولەکە هاتنـە لای پێغەمبەر ﷺ هەروەها سـەرانی نەصرانیی یـەکانیش هاتنـە خزمـەتی، جوولەکەکان گوتیان: ئەی موحەممەد ئەگەر ببنە جوولەکە ڕێی ڕاست دەگرن، نەصرانیی یـەکانیش گوتیـان: ئەگـەر ببنــە نەصـرانیی هـەمووتان ڕێــی ڕاســت دەگــرن، خــوای پەروەردگاریش ئـاوا وەڵامی دانەوە، کە لە ئایەتەکـەدا هاتوە.

٢ – هۆی هاتنە خـوارەوەی ئـەو ڕسـتـەیە، کـە دەفـەرموێ: ﴿ صِبْغَةَ ٱللَّهِ ۖ وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ ٱللَّهِ صِبْغَةً ۖ وَنَحْنُ لَهُۥ عَٰبِدُونَ ﴾، {(قَالَ ابْن عبَّاسٍ: إنَّ النَّصارى كَـانَ إذا وُلِـدَ لأَحَـدهم ولـد، فـأتى عَلَيـهِ سَبعة أيَّام صَـبَغُوه فـي مَـاء لَـهُم يُقَـالُ لَـهُ: الـمَعْمُودي، ليُطَـهِّروه بِذَلِـك، ويَقُولُونَ: هَـذَا طهور مَكَان الخِتَّان، فإذا فَعَلوا ذَلِـكَ قَـالوا: الآن صَـارَ نَـصرَانياً حَقـاً، فَأَنْزَلَ اللهُ تَعَالـى هَـذِهِ الآيَـةَ) (أسـباب الـنزول للنيـسابوري، ص: (٢٨)}، واتـە: عەبدوڵـلای کـوڕی عـەبباس دەڵـێ: نەصـرانیی یـەکان وەختـی خـۆی کـە منـداڵێکیان دەبـوو، کـوڕ یـان کـچ کاتێـك حەوتووی دەچوو، لە ئاوێکیان هەڵدەکێشـا کە پێی دەگوترێ: (تعمید) واتـە: لـە

ئاو هەڵکێشان، ئنجا کە لە ئاویان هەڵدەکێشا بۆ ئەوەی پاکی بکەنەوەو دەیانگوت: ئەمە پاککردنەوەیەکە لەجیاتی خەتەنکردن، ئنجا کە ئەوەیان دەکرد، دەیانگوت: ئەوە بەڕاستی بوو بە نەصرانیی، خوای بە بەزەییش بەرپەرچی وانی داوەتەوە، کە نەخێر بوون بە بەندەی خوا بریتی نیە لە لە ئاو هەڵکێشان، بەڵکو شتی دیکەیە، کە خوا ﷻ باسی دەکات.

## مانای گشتی ئایەتەکان

خوا ﷻ هەر دەربارەی جوولەکەو نەصرانیی یەکان دەدوێ، ئەو قسە بێسەروبەرانەی کە دەیانکەن بەرپەرچیان دەداتەوە، دەفەرموێ: ﴿ وَقَالُواْ كُونُواْ هُودًا أَوْ نَصَـٰرَىٰ تَهْتَدُواْ ﴾، وە گوتیان: ببنە جوولەکەو نەصرانیی ڕێی ڕاست دەگرن، هەڵبەتە وەنەبێ پێکەوە وایانگوتبێ، یاخود گوتبێتیان یاخود ببنە جوولەکە یان ببنە نەصرانیی، بەڵکو جوولەکە گوتوویانە: ببنە جوولەکەو، نەصرانییش گوتوویانە: ببنە نەصرانیی، بەڵام خوا ﷻ قسەی هەردووکیان کۆدەکاتەوەو کاتێك قسەی هەردووکیان کۆببێتەوە، واتە: گوتوویانە ببنە جوولەکە یان نەصرانیی، بەڵام ئایا خوا ﷻ، چۆنیان وەڵام دەداتەوە؟ ﴿ قُلْ بَلْ مِلَّةَ إِبْرَٰهِـۧمَ حَنِيفًا ﴾، بڵێ ڕێبازی ئیبراهیم بگرن، ئیبراهیم کە وازی لە هەرچی ڕێبازی لارو خوارو هەرچی ناشەرعییو غەڵەتو پەڵەتبوو هێنابوو بەرەو ڕاستە شەقامی خوا بە یەکگرتن (توحید)، ﴿ وَمَا كَانَ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴾، وە لە هاوبەش بۆ خوا دانەران نەبوو، واتە: ئێوە کە خۆتان گیرۆدە کردوە بە شیركو هاوبەش بۆ خوا دانانەوە، ئایا ئێوە لەسەر ڕێبازی ئیبراهیمن، نەخێر، بەڵکو موحەممەد ﷺ لەسەر ڕێبازی ئیبراهیمە، کە دان بە هەموو کتێبە پێشووەکاندا دێنیو هەموو پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) بەڕاست دەزانێ، وە جگە لە خواش هیچی دیکە ناپەرستێ، نەك وەك جوولەکەو نەصرانیی یەکان کە زاناو ڕاهیبەکانی خۆیان دەپەرستن: ﴿ ٱتَّخَذُوٓاْ أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَـٰنَهُمْ أَرْبَابًا مِّن دُونِ ٱللَّهِ ... ﴿٣١﴾ ﴾

التوبة، بەڵام لە ئیسلامدا تەنیا خوای تاكو پاك دەپەرستریٚ، ئا ئەوە ئەو دینە ڕاستەیە كە ئیبراهیم لەسەری بووە، ئنجا خوا ﷻ فەرمان دەكات بە پێغەمبەری كۆتایی ﷺ، وە بە شوێنكەوتووانی، كە هاوەڵانی بەرێزی پێش هەموو كەس گرتۆتەوە، وە دوایی چین بە چینی مسوڵمانان تا ژیانی بەشەر كۆتایی پێدیٚ، هەمووان دەگرێتەوە، دەفەرمویٚ: ﴿ قُولُوٓاْ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ ﴾، ئێوە ئەی موحەممەد ﷺو ئەی مسوڵمانانی كە لە خزمەت موحەممەد دان ! بڵێن: { كە ئا ئەوە ڕێبازی ئێمەیەو ئەوە دینی حەقە }، ئیمانمان بە خوا هێنا بەو شێوەیە كە خوا فەرموویەتی، من لە دەرسەكانی ڕابردوودا باسمكرد، كە ئیمان حەقیقەتێكە بە عەقڵ فەهم دەكریٚو وەردەگیریٚو، بە دڵ قبووڵ دەكریٚو پەسند دەكریٚو، بە زمان دانی پێدادەهێنریٚ، وە بە ئەندامەكانیش جێبەجیٚ دەكریٚ، وە ئیمان بریتیە لە ئیمان بە خواو بە فریشتەكانیو بە كتێبەكانیو بە پێغەمبەرانی (علیهم الصلاة والسلام)و بە ڕۆژی دوایی، دەفەرمویٚ: ﴿ قُولُوٓاْ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيۡنَا وَمَآ أُنزِلَ إِلَىٰٓ إِبۡرَٰهِـۧمَ وَإِسۡمَٰعِيلَ وَإِسۡحَٰقَ وَيَعۡقُوبَ وَٱلۡأَسۡبَاطِ وَمَآ أُوتِيَ مُوسَىٰ وَعِيسَىٰ وَمَآ أُوتِيَ ٱلنَّبِيُّونَ مِن رَّبِّهِمۡ لَا نُفَرِّقُ بَيۡنَ أَحَدٖ مِّنۡهُمۡ وَنَحۡنُ لَهُۥ مُسۡلِمُونَ ﴾، بڵێن: ئیمانمان هێناوە بە خواو بەوەی كە بۆمان نێردراوەتە خوار (كە قورئانە وە سوننەتی پێغەمبەرە ﷺ چونكە ئەویش هەر وەحییە)، وە بەوەی كە نێرراوەتە خوار بۆ ئیبراهیم، وە بۆ ئیسماعیل، وە بۆ ئیسحاق، وە بۆ یەعقووب، وە بۆ نەوەكانی یەعقووب، {چونكە (أسْبَاط) كۆی (سَبْط) كە كوڕەكانی نین، كوڕەكانی یەعقووب تەنیا (یوسف)یان ﷺ پێغەمبەر بووە، ئەوانی دیكە پێغەمبەر نەبوونە، لەسەر ڕای زۆربەی زانایان، بەڵكو لە نەوەكانی یەعقووب پێغەمبەرانی دیكەیان بوون، كە داوودو سولەیمان دووانیانن، هەروەها زەكەریاو یەحیا دووانی دیكەیانن (علیهم الصلاة والسلام)}، وە ئیمانمان بەوە هێنا كە بەخشراوە بە مووساو بە عیسا، وە بە هەموو پێغەمبەرانی دیكە، كە لە پەروەردگارەوە پێیان دراوە، جیاوازی ناخەینە نێوان هیچ كام لە پێغەمبەران {هیچیان هەڵناوێرین جیای ناكەینەوە بڵێین: ئیمانی پیٚ ناهێنین، وەك جوولەكە موحەممەدو عیسا

جیادەکەنـەوەو، نەصـرانیی یـەکان موحەممـەد جیادەکەنـەوە، ئیدیکـە ئیدیکـە جیادەکەنـەوە، بـەڵام مـسوڵمان ئیمـان بـە هـەموو پێغەمبـەرانی خـوا دێـنن، وە بـە هـەموو کتێبـەکانی خـوا} ﴿ وَنَحْنُ لَهُۥ مُسْلِمُونَ ﴾، وە ئێمـە بـۆ خـوا ملکەچـین، هەرچی لە خواوە بۆمان بێت بۆی ملکەچین‌و پێوەی پابەنـدین، نـەك وەك ئێـوە، ئەوەی کە پێتان خۆشە پێوەی پابەند دەبن، وە ئەوەی کە پێتان ناخۆشە لێی لامل دەبن! ئنجا لە کۆتایی ئەو قسەیەدا پێیان دەفەرموێ: ﴿ فَإِنْ ءَامَنُواْ بِمِثْلِ مَآ ءَامَنتُم بِهِۦ فَقَدِ ٱهْتَدَواْ ﴾، جا ئەگەر ئیمانیان هێنـا بـە وێنـەی ئێـوە کـە ئیمانتـان هێنـاوە، ئەوە ڕێی ڕاستیان گرتوە، ڕێی ڕاست ئەوەیە کە بەو شێوەیەی ئێوە ئیمان بێـنن، ئیمان بەوە بێنن کە ئێوە ئیمانتـان پێـی هێنـاوە، ئـەی ئۆممـەتی موحەممـەد ﷺ ﴿ وَّإِن تَوَلَّوْاْ فَإِنَّمَا هُمْ فِى شِقَاقٍ ﴾، وە ئەگەر پـشتیان هـەڵکردو پـشتیان تێکرد، ئـەوە بە تەئکید ئەوانە لە دووبەرەکیی دان، لەگەڵ ئێوەو لەگەڵ خوای پەروەردگاریشدا ﴿ فَسَيَكْفِيكَهُمُ ٱللَّهُ ﴾، ئەوکاتەش خوات بەسە، خوا ئەوانت لە کۆڵ دەکاتـەوە ﴿ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴾، وە ئەو بیسەری زانایە، دووعاکانتان دەبیستیّ‌و قسەی وان دەبیستیّ‌و قسەی ئێوەش، وە زاناشـە، واتـە: نـەك هـەر قـسەکانتان دەبیـستیّ، بەڵکو زانایە بەوەی نێو دڵ‌و دەروونیشتان، پێویستیتان چییە؟ نیەتتـان چۆنـە؟ هـەمووی ئاگـا لێیـە، دوایـی دەفـەرموێ: ﴿ صِبْغَةَ ٱللَّهِ ۖ وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ ٱللَّهِ صِبْغَةً ۖ وَنَحْنُ لَهُۥ عَـٰبِدُونَ ﴾، ڕەنگکردنی خوا، ڕەنگکردنی کێ لە هی خوا باشترە، وە ئێمـە بۆ ئـەو بەنـدەین‌و پەرسـتارین‌و بەندایـەتیی بـۆ دەکـەین، ئـەوەش وەك بلێـی لـە بەرپەرچدانەوەی نەصرانیی یەکانە، کە بە پێی ئەو هۆی هاتنە خـوارەوەی باسمان کرد، لە دوای حەوت ڕۆژ منداڵی خۆیـان لـە ئـاو هەڵدەکێـشن‌و (تعمیـد)ی دەکـەن‌و دەڵێن بوو بە نەصرانیی، خوا دەفەرموێ: نا، دینداریی ڕاسـتەقینە ئەوەیـە کـە بـە ڕەنگی خوا خۆت ڕەنگ بکەی‌و دینی خوا لەخۆتدا ڕەنگ پیّ بدەیەوەو، بەرجەسـتە بکەی، ئیمان‌و عەقیدەکەی بە تێگەیشتنەوە، عیبادەتەکەی، ڕەوشتەکەی، حوکم‌و فەرمانەکانی لـە خۆتـدا ڕەنـگ پێبدەیـەوە، بـە دینـی خـوا خـۆت ڕەنگـە بکـەی، کـە

ڕەنگێكی جوانەو هەر ئەوە ڕەنگە، ئنجا دەفەرموێ: ﴿ قُلْ أَتُحَآجُّونَنَا فِى ٱللَّهِ وَهُوَ رَبُّنَا وَرَبُّكُمْ وَلَنَآ أَعْمَٰلُنَا وَلَكُمْ أَعْمَٰلُكُمْ وَنَحْنُ لَهُۥ مُخْلِصُونَ ﴾، واتە: تۆ پێیان بڵێ: ئایا ئێوە دەربارەی خوا شەڕە قسەو موناقەشەمان لەگەڵ دەكەن، كە گوایە ئێوە لە خوا نزیكترن، چونكە خوا لە سووڕەتی (المائدة)دا دەفەرموێ: ﴿ وَقَالَتِ ٱلْيَهُودُ وَٱلنَّصَٰرَىٰ نَحْنُ أَبْنَٰٓؤُا۟ ٱللَّهِ وَأَحِبَّٰٓؤُهُۥ ...﴿١٨﴾ ﴾ المائدة، جوولەكەو نەصرانیی یەكان گوتیان: ئێمە كوڕانی خواو خۆشەویستانی خواین، جا لێرەدا دەفەرموێ: بڵێ: ئایا دەربارەی خوا شەڕە قسەو دەمبەدەمەمان لەگەڵ دەكەن، كە ئێوە بە حیساب لە خوا نزیكترن ! ﴿ وَهُوَ رَبُّنَا وَرَبُّكُمْ ﴾، لە حاڵێكدا كە خوا پەروەردگاری ئێمەو ئێوەشە، ئێوە لە ئێمەتان زیاتر بەش پێوەنییەو، ئێمەش بەقەدەر ئێوەمان بەش پێوەیەو، پەروەردگاری هەموو لایەكمانە ﴿ وَلَنَآ أَعْمَٰلُنَا وَلَكُمْ أَعْمَٰلُكُمْ ﴾، ئێمە كردەوەی خۆمان بۆ خۆمان، ئێوەش كردەوەی خۆتان بۆ خۆتان، ئەگەر ئێوە كردەوەی باشتان هەبێ (وەختی خۆی بەر لەوەی ئیسلام[1] بێ)، ئەگەر ئێمەش كردەوەی باشمان هەبێت، ئەوە ئێوە بۆتان قەبووڵكراوەو ئەوەی ئێمەش قەبووڵ دەبێ، كەواتە: چ فەزڵو ئیمتیازێكتان بەسەر ئێمەدا هەیە؟ ﴿ وَنَحْنُ لَهُۥ مُخْلِصُونَ ﴾، وە ئێستا ئێمە خۆشمان بۆ خوا ساغو یەكلاكردۆتەوەو هاوبەشی بۆ دانانێین، بەڵام ئێوە هاوبەشی بۆ دادەنێن، عیسا عليه السلام دەكەنە هاوبەشیو دەڵێن: كوڕی خوایەو دایكی، دەكەنە هاوبەشیو، (الروح القدس) دەكەنە هاوبەشی، وە جوولەكەكان عوزێر بە كوڕی خوا دادەنێن، وە ڕاهیبو زاناكانتان دەكەنە هاوبەش لە پەرستندا، ئنجا دەفەرموێ: ﴿ أَمْ تَقُولُونَ إِنَّ إِبْرَٰهِـۧمَ وَإِسْمَٰعِيلَ وَإِسْحَٰقَ وَيَعْقُوبَ وَٱلْأَسْبَاطَ كَانُوا۟ هُودًا أَوْ نَصَٰرَىٰ ﴾، واتە: یان ئایا دەڵێن: ئیبراهیمو ئیسماعیلو ئیسحاقو یەعقووبو نەوەكانی یەعقووب، جوولەكەو

---

١) لێرەدا مەبەستمان كردەوەی ئایینیو خواپەرستییە، ئەگەرنا لە بواری دنیاداریيو هەڵسوكەوتدا چاكە هەر چاكە لە هەر كەسێكەوە بێ، هەروەها خراپەش هەر خراپە.

نەصرانیی بوون، ئایا وا دەڵێن؟ هەروەها لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ کە موناقەشەو شەڕە قسەیان کردوە، کاتێك تێنیان بۆ هاتوە جوولەکەکان گوتوویانە: ئیبراهیمو ئیسماعیلو ئیسحاقو یەعقووبو ئەوانەش هەموویان جوولەکە بوون. نەصرانییەکانیش گوتوویانە: نەصرانیی بوونو، لەسەر بەرنامەی نەصرانیی‌یەت بوون ! ﴿ قُلْ ءَأَنتُمْ أَعْلَمُ أَمِ ٱللَّهُ ﴾، پێیان بڵێ: ئایا ئێوە زاناترن یان خوا ؟! ئێوە باشتر دەزانن داخۆ ئەوانە لەسەر چ بەرنامەو ڕێبازێك بوون، یان خوا باشتر دەزانێ؟ ﴿ وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّن كَتَمَ شَهَـٰدَةً عِندَهُۥ مِنَ ٱللَّهِ ﴾، وە کێ ستەمکارترە، لە کەسێك کە شایەدییەکی لەلایە، لەلایەن خواوە، کەچی دەیشارێتەوە، واتە: ئێوە زۆر چاك دەزانن کە یەهودییەتو نەصرانییەت لە دوای ئیبراهیمەوە پەیدابووە، ئنجا کە لە دوای وی پەیدابوون، چۆن ئیبراهیمێکی پاكو ڕاست (حَنِيف)یان لەسەر دەبێ، کە زیاتر لە هەزار ساڵ دوای خۆی پەیدابوون؟! ﴿ وَمَا ٱللَّهُ بِغَـٰفِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ ﴾، وە بێگومان خوا بێئاگا نیە لەوەی ئێوە دەیکەن. ﴿ تِلْكَ أُمَّةٌ قَدْ خَلَتْ لَهَا مَا كَسَبَتْ وَلَكُم مَّا كَسَبْتُمْ ﴾، ئەوانە کۆمەڵێك بوون تێپەڕین، ئەوەی کە وەدەستیان هێنابێ لە کردەوەی چاك یان خراپ، خۆیان خاوەنینیو لە گەردنی خۆیان دایە، چاك یان خراپ، ئێوەش چ وەدەستبێنن، چ کردەوەیەك ئەنجام بدەن، لە چاكو لە خراپ، ئێوەش دەبن بە خاوەنی کردەوەی خۆتان ﴿ وَلَا تُسْـَٔلُونَ عَمَّا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴾، ئێوە لێتان ناپرسرێتەوە دەربارەی کردەوەی ئەوان، وەك ئەوانیش بەرپرسیارنین دەربارەی کردەوەکانی ئێوە.

## چەند مەسەلەیەكی گرنگ

**مەسەلەی یەكەم:** ئایینو ڕێبازی ئیبراهیم عليه السلام کە لە دەرسی پێشوودا باسمان کرد ئیبراهیم خاڵی هاوبەشی هەموو خاوەن کتێبو بەرنامە ئاسمانییەکانە، کەس نکووڵیی لە ئیبراهیم نیە، بۆیە خوا ﷻ زۆر باش ڕێبازی ئیبراهیمی باسکردوە، هەڵوێستەکانی باسکردوە، موناقەشەو وتووێژەکانی لەگەڵ ئەهلی

کوفردا زۆر جوان ڕوون کردۆتەوە، تاکو دەربکەوێ کە ئیبراهیم عليه السلام ئەوەی کە زۆر داکۆکیی لەسەر کردوەو جەختی لەسەر کردوە، بریتی بووە لە خوا بەیەکگرتنو تەنیا خوا بە پەرستراو دانان، ئێستاش کێ زۆر جەخت لەسەر ئەم مەسەلەیە دەکاتەوە؟ بێگومان موحەممەد ﷺ، ئەمما جوولەکەو نەصرانییو خاوەن بەرنامە ئاسمانییەکانی دیکە، هەموویان گیرۆدە بوون بە شیرکەوە، کەواتە: ئێستا شوێنکەوتەی ڕاستەقینە بۆ ئیبراهیم، موحەممەدە ﷺ، وەك خوا دەفەرمویٚ: ﴿ إِنَّ أَوْلَى ٱلنَّاسِ بِإِبْرَٰهِيمَ لَلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُ وَهَٰذَا ٱلنَّبِىُّ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ۗ وَٱللَّهُ وَلِىُّ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٦٨﴾ ﴾ آل عمران، واتە: بێگومان نزیکترین کەسو لە پێشترین کەس، لە ئیبراهیم، ئەوانە بوون کە کاتی خۆی شوێنیکەوتوون، وە ئەم پێغەمبەرەیە ﷺ، وە ئەوانەن کە ئیمانیان بەو پێغەمبەرە هێناوە، ئەوانە لە هەموو کەس لە ئیبراهیم لە پێشترن، کە ڕاست لەسەر ڕاستەشەقامی ئەون، ئەمما لاف لێدانی جوولەکەو نەصرانیی یەکان، کە ئێمە لە ئیبراهیم نزیکترینو ڕێزمان بۆی هەیە، هەموو بایی فلسێکە، چونکە لەگەڵ ڕێبازەکەی ئیبراهیمدا نین، کە بریتیە لە تەنیا خوا پەرستنو خوا بەیەگرتن، کەچی جوولەکەو نەصرانیی یەکان گیرۆدەی چەندان جۆرە شیركو کوفربوونە.

**مەسەلەی دووەم:** یەکێك لە بەڵگە هەرە گەورەکانی ئەهلی ئیسلام، کە ئەهلی هەقن، وە تەنیا ئیسلام ماوەتەوە، وەك ئایینێکی خوایی بەبێ دەستکاریی کرانو بەبێ دەست تێوەردان، وە تەنیا کتێبێك لەبەر دەستی بە شەرییەتدا هەبێت، کە تۆ لێی دڵنیابی، مسۆگەر ئەو کتێبە فەرمایشتی خوایە، تەنیا قورئانە، وە تەنیا پێغەمبەرێك ﷺ کە ژیانەکەی بۆ ئێمە زۆر جوان شیکرابێتەوەو ڕوونبێ و بە سەنەدێکی ڕاست بە ئێمە گەیشتبێ، کە ئەو پێغەمبەرە چۆن ژیاوەو چی فەرمووە، چی کردوە؟ تەنیا موحەممەدە ﷺ، وە ئەگەر شتێکیش دەربارەی پێغەمبەرانی دیکە بزانین بە سەنەدێکی ڕاستو دروست، تەنیا لەڕێی ئەو قورئانەوەیە کە بۆ موحەممەد هاتوە ﷺ، گەورەترین بەڵگە لەسەر ئەوە چییە؟ ئەوەیە کە هەموو خاوەن بەرنامە ئاسمانییەکانی دیکە یەکتر بە

کافر دادەنێن‌و، یەکتر بە گومڕا دادەنێن‌و یەکتر قەبووڵ ناکەن‌و نکووڵیی لەیەك دەکەن، بەڵام ئەهلی ئیسلام، دان بە هەموو پێغەمبەران دادێنن‌و ڕێز لە هەمووان دەگرن‌و دان بە هەموو کتێبەکانی خوادا دێنن، ئەوەتا دەڵێن: ﴿ قُولُوٓاْ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيۡنَا وَمَآ أُنزِلَ إِلَىٰٓ إِبۡرَٰهِـۧمَ وَإِسۡمَٰعِيلَ وَإِسۡحَٰقَ وَيَعۡقُوبَ وَٱلۡأَسۡبَاطِ وَمَآ أُوتِيَ مُوسَىٰ وَعِيسَىٰ وَمَآ أُوتِيَ ٱلنَّبِيُّونَ مِن رَّبِّهِمۡ لَا نُفَرِّقُ بَيۡنَ أَحَدٖ مِّنۡهُمۡ وَنَحۡنُ لَهُۥ مُسۡلِمُونَ ﴾، ئەوە بەڕاستی گەورەترین بەڵگەیە کە تەنیا کۆمەڵێك خاوەنی دینی هەق بن، ئوممەتی (مُحَمَّد المصطفى)ن ﷺ، کە ڕێزیان بۆ هەموو پێغەمبەران هەیە، وە دان بە هەموو کتێبە ئاسمانییەکاندا دێنن.

**مەسەلەی سێیەم:** دەربارەی وشەی: ﴿ وَٱلۡأَسۡبَاطِ ﴾، واتە: نەوەکانی (یەعقووب)و ئەو بنەماڵەو عەشیرەت‌و تیرانە کە لە یەعقووب پەیدابوون کە دوازدە (١٢) تیرە بوون. وەك خوا ﷻ باس دەکات، ﴿ وَقَطَّعۡنَٰهُمُ ٱثۡنَتَيۡ عَشۡرَةَ أَسۡبَاطًا أُمَمٗاۚ ... ﴿١٦٠﴾ ﴾ الأعراف، واتە: دەفەرموێ: کردمانن بە دوازدە تیرەو کۆمەڵ، کەواتە: لێرەدا دەبێ زۆر وریابین، برایەکانی (یوسف) ﷺ کە درۆیان لێ واقیع بووەو، زوڵمیان لێ واقیع بووە، وە بێفەرمانیی بابیان لێ واقیع بووە، کە ئەوانە بێگومان لەگەڵ پێغەمبەرایەتیدا ناگونجێن، بۆیە ناگونجێ ئەوانە پێغەمبەر بووبن، بەڵام دوایی کە تۆبەیان کردوە، دیارە بوونەتە پیاوی باش، کەواتە: کە دەفەرموێ: ﴿ الأَسْبَاطِ ﴾، وەحییان بۆ هاتوە، لێرەدا، وە لە چەند شوێنێکی دیکە لە قورئاندا، یانی لەنێو ئەو تیرانەدا کە لە کوڕانی یەعقووب پەیدابوون، پێغەمبەرانیان هەبوون‌و وەحییان بۆ هاتوە، کەواتە: مەبەست ئەوەیە کە لەنێو ئەو تیرەو هۆزانەدا کەسانی وابوو ون، نەك کوڕەکانی یەعقووب هەر دوازدە یان پێغەمبەر بووبن‌و وەحییان بۆ هاتبێ! هەڵبەتە هەندێك لە زانایان ڕایان وایە ئەوانیش هەموویان پێغەمبەر بووبن، بەڵام پێم وایە نەمانپێکاوەو ناگونجێ کەسانی وا پێغەمبەر بووبن!.

**مەسەلەی چوارەم:** کە دەفەرموێ: ئەگەر ئیمانیان هێنا بەو شێوەیەی کە ئێوە ئیمانتان هێناوە، ئەوە ڕێی ڕاستیان گرتوە، ﴿فَإِنْ ءَامَنُواْ بِمِثْلِ مَآ ءَامَنتُم بِهِۦ فَقَدِ ٱهْتَدَواْ﴾، ئەوە بەڕاستی بەهێزترینو ئاشکراترین بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە بە هاتنی ئیسلام، هەموو بەرنامەکانی دیکە نەسخ بوونەتەوە، وە هەموو ئەو قسانەی کە دەکرێن کە: ئەگەر جوولەکە لەگەڵ دینی خۆیاندا ڕاست بکەن، وە نەصرانیی لەگەڵ دینی خۆیاندا ڕاست بکەنو، زەردەشتیی ڕاست بکەنو هەرکەس بەدینی خۆی لە دوارۆژدا هەموویان سەرفراز دەبن !! ئەو قسەیە زۆر قسەیەکی پووچو بێ بەڵگەیە، چونکە خوا زۆر بە ڕوونیی دەفەرموێ: ئەگەر ئیمانیان هێنا بەو شێوەیەی کە ئێوە ئیمانتان هێناوە، ئەو کاتە مانای وایە ڕێی ڕاستیان گرتوە، واتە: ئەگەر بوونە مسوڵمان، ئەوە ڕێی ڕاستیان گرتوە، ﴿وَّإِن تَوَلَّوْاْ فَإِنَّمَا هُمْ فِي شِقَاقٍ﴾، بەڵام ئەگەر پشتیان هەڵکرد، ئەوە لە دووبەرەکییدانو دژایەتی خواو دینی خوا دەکەن.

**مەسەلەی پێنجەم:** کە خوا باسی ڕەنگکردن (صبغة) خوا دەکات، مەبەست پێی ئەوەیە کە دەبێ دینو ئیمانو دینداریی لە مرۆڤدا ڕەنگ بداتەوەو، ئینسان دەبێ ئەو ڕەنگە لە خۆیدا بەرجەستە بکاتو، دەبێ لە قسەو بیروبۆچووونتدا، لە تێگەیشتنتدا، لە عیبادەتتدا، لە عەقیدەتدا، لە هەڵسوکەوتی تاکییتو خێزانییتو، لە هەموو لایەنەکانی ژیانتدا ئیمانو ئیسلامو بەندایەتییت، بۆ خوا ڕەنگ بداتەوەو، دەبێ ئەو ئیمانو ئیسلامە تۆ ڕەنگ بکات بەو ڕەنگەی کە خوا بۆی هەڵبژاردووی، ئەوجار مانای وایە تۆ بەندایەتییت بۆ خوا ئەنجامداوە، ئەگەرنا تەنیا ناوی مسوڵمان لە خۆنان هیچ نیە.

**مەسەلەی شەشەم:** کە خوای بەبەزەیی دەفەرموێ: ﴿قُلْ أَتُحَآجُّونَنَا فِي ٱللَّهِ وَهُوَ رَبُّنَا وَرَبُّكُمْ وَلَنَآ أَعْمَٰلُنَا وَلَكُمْ أَعْمَٰلُكُمْ وَنَحْنُ لَهُۥ مُخْلِصُونَ﴾، ئەوە بەڕاستی بەڵگەیەکی بەهێزە، بۆ دەمکوتکردنی ئەو جوولەکەو نەصرانیی یانەی، کە هەمیشە لافیان لێ دەداو دەیانگوت: ئێمە لە خوا نزیکترین ئەی موحەممەد،

ئەی مسوڵمانەکان لە ئێوە ! وە دەیانگوت: دینی ئێمە موعجیزەی زۆر گەورە گەورەی بوو ون، بەڵام وەك پێشتریش گوتوومانە لەبەرئەوە کە پێغەمبەری ئێمەی مسوڵمان موعجیزەی بەرهەستی نەبوون، وەك بۆ پێغەمبەرانی پێشوو هاتوون، چونکە ئەوە پێغەمبەرانی پێشوو لە قۆناغێکدا هاتوون کە بەشەرییەت لە قۆناغێکی ساوا دابووەو، پێویستی بە موعجیزەی بەرهەست بووە، بەڵام کاتێك بەشەرییەت گەیشتۆتە قۆناغی پێگەیشتن، خوا موعجیزەیەکی فیکریی و عیلمیی بۆ ناردوە، کە قورئانە، چونکە ئەوکاتە کە ئینسان ساوایە دەیەوێ شت بەچاوی خۆی ببینێ، بەڵام کە دەگاتە قۆناغی پێگەیشتنی عەقڵیی، ئەگەر شت بەچاویش نەبینێ دەتوانێ بە عەقڵ دەرکی بکات و ئەنجامگیریی بکات و هەڵیبهێنجێ، جا خوا ﷻ لێرەدا بەڵگەیەك فێری مسوڵمانان دەکات، کە دەفەرموێ: ﴿ قُلۡ أَتُحَآجُّونَنَا فِي ٱللَّهِ ﴾، بڵێ: ئایا ئێوە دەربارەی خوا شەڕە قسەمان لەگەڵ دەکەن. ﴿ وَهُوَ رَبُّنَا وَرَبُّكُمۡ ﴾، لە حاڵێکدا کە بە یەکسانیی پەروەردگاری هەردوو لامانە، وە نەبێ ئێوە زیاتر بەشتان پێوەی هەبێ، وەك چۆن مشووری لە ئێوە خواردوەو پێغەمبەری لەنێو ئێوەدا ناردوە (کاتی خۆی بۆ باب و باپیرانتان) و بەرنامەی بۆ ناردوون، ئەوەتا بۆ ئێمەشی ناردوون، کەواتە: ئێوە لە پێشتر نین بە خوا لە ئێمەو، هەمووومان بۆ خوا وەك یەکین، ئنجا دێتە سەر باسی کردەوە ﴿ وَلَنَآ أَعۡمَٰلُنَا وَلَكُمۡ أَعۡمَٰلُكُمۡ ﴾، کردەوەی خۆمان بۆ خۆمان، ئێوەش کردەوەی خۆتان بۆ خۆتان، کە جیاوازیی نێوان کردەوەی ڕاست و شەرعیی و، هی ناڕاست و ناشەرعیی، ئاسمان و ڕێسمانە !

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی بیست و نۆیەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان چوار (٤) ئایەت لە سوورەتی (البقرة) دەگرێتە خۆی، لە ئایەتی (١٤٢ تاكو ١٤٥)، لەم چوار (٤) ئایەتەدا خوا ﷻ باسی ڕووداوێكی زۆر گرنگو مێژوویی دەكات لە مێژووی ئیسلامو مسوڵماناندا، كە بریتییە لە دیاریكردنی ڕووگە (قِبلة)، وە بەو بۆنەوە كۆمەڵێك ئاڕاستە (توجیهات)و ئامۆژگاریی دەخاتەڕوو بۆ پێغەمبەری كۆتایی ﷺو بۆ شوێنكەوتووانی لە ئوممەتی، هەروەها دێتە سەر باسی هەڵوێستی نەیارو ناحەزانی مسوڵمانان لە جوولەكەو لە نەصرانییو لە هاوبەش بۆ خوا دانەرەكان، كە لە ڕووی نەفامییەوە ڕەخنە دەگرن لەوە كە پێغەمبەرو مسوڵمانان پێشتر ڕوویان كردۆتە (بیت المقدس) لە كاتی نوێژەكانیانداو، ئەمجارە خوا ﷻ ڕووی پێ وەرسووڕاندوون بەرەو كەعبە، وە لەوبوارەدا خوا ﷻ وەڵامێكی دەمكوتكەریان دەداتەوە.

﴿ سَيَقُولُ السُّفَهَاءُ مِنَ النَّاسِ مَا وَلَّاهُمْ عَن قِبْلَتِهِمُ الَّتِي كَانُوا عَلَيْهَا ۚ قُل لِّلَّهِ الْمَشْرِقُ وَالْمَغْرِبُ ۚ يَهْدِي مَن يَشَاءُ إِلَىٰ صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿١٤٢﴾ وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَاكُمْ أُمَّةً وَسَطًا لِّتَكُونُوا شُهَدَاءَ عَلَى النَّاسِ وَيَكُونَ الرَّسُولُ عَلَيْكُمْ شَهِيدًا ۗ وَمَا جَعَلْنَا الْقِبْلَةَ الَّتِي كُنتَ عَلَيْهَا إِلَّا لِنَعْلَمَ مَن يَتَّبِعُ الرَّسُولَ مِمَّن يَنقَلِبُ عَلَىٰ عَقِبَيْهِ ۚ وَإِن كَانَتْ لَكَبِيرَةً إِلَّا عَلَى الَّذِينَ هَدَى اللَّهُ ۗ وَمَا كَانَ اللَّهُ لِيُضِيعَ إِيمَانَكُمْ ۚ إِنَّ اللَّهَ بِالنَّاسِ لَرَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴿١٤٣﴾ قَدْ نَرَىٰ تَقَلُّبَ وَجْهِكَ فِي السَّمَاءِ ۖ فَلَنُوَلِّيَنَّكَ قِبْلَةً تَرْضَاهَا ۚ فَوَلِّ وَجْهَكَ شَطْرَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ ۚ وَحَيْثُ مَا كُنتُمْ فَوَلُّوا وُجُوهَكُمْ شَطْرَهُ ۗ وَإِنَّ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ لَيَعْلَمُونَ أَنَّهُ الْحَقُّ مِن رَّبِّهِمْ ۗ وَمَا اللَّهُ بِغَافِلٍ عَمَّا

يَعْمَلُونَ ﴿١٤٤﴾ وَلَئِنْ أَتَيْتَ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ بِكُلِّ آيَةٍ مَّا تَبِعُوا قِبْلَتَكَ ۚ وَمَا أَنتَ بِتَابِعٍ قِبْلَتَهُمْ ۚ وَمَا بَعْضُهُم بِتَابِعٍ قِبْلَةَ بَعْضٍ ۚ وَلَئِنِ اتَّبَعْتَ أَهْوَاءَهُم مِّن بَعْدِ مَا جَاءَكَ مِنَ الْعِلْمِ ۙ إِنَّكَ إِذًا لَّمِنَ الظَّالِمِينَ ﴿١٤٥﴾ ﴾.

## مانای وشه به وشه‌ی ئایه‌ته‌كان

((لەمەو دوا خەڵكی گەوجو نەفام دەڵێن: چ شتێك مسوڵمانانی لەو ڕووگەیە لادا، كە لەوەو پێش لەسەری بوون، بڵێ: ڕۆژهەڵاتو ڕۆژئاوا هی خوان، هەركەسێكی بوێ بەرەو ڕاستە ڕێ ڕێنمایی دەكات ﴿١٤٢﴾ هەروەها بەو جۆرەش گێڕاومانن بە كۆمەڵێكی میانە تاكو شایەد بن بەسەر خەڵكەوە، وە بۆ ئەوەی پێغەمبەریش بەسەر ئێوەوە (ئەی مسوڵمانینە !) شایەد بێت، وە ئەو ڕووگەیەی كە پێشتر لەسەری بوون تەنیا بۆ ئەوەدامان نابوو، تاكو بزانین كێ بەدوای پێغەمبەر ﷺ دەكەوێو جیادەبێتەوە لەوەی كە لەسەر پاژنەكانی هەڵدەگەڕێتەوە، هەرچەندە ئەو ڕووكردنە ڕووگەی پێشووە (لەسەر دڵی هەمووان) جگە لەوانەی خوا ڕێنمایی كردبوون، گەورەو قورس بوو، وە ناشگونجێ خوا ئیمانەكانتان زایە بكات، بێگومان خوا بەرانبەر بە خەڵكی یەكجار بە پەرۆشەو بەخشندەیە ﴿١٤٣﴾ بێگومان ئێمە ڕوو لە ئاسمان گێڕانت دەبینین بۆیە بە مسۆگەری ڕووت پێ دەكەینە ڕووگەیەك كە دڵ پەسندتە، دەجا ڕوو بكە لای مزگەوتی حەرام، وە لە هەركوێیەكیش بوون، هەر ڕووتان بەرەو لای وەرسوورێنن، وە دڵنیابن كە ئەوانەی كتێبیان دراوەتێ دەزانن ئەوە هەقە لە پەروەردگاریانەوە، وە خوا لەوەی دەیكەن بێئاگا نیە ﴿١٤٤﴾ وە ئەگەر بێتو هەرچی بەڵگەیە بۆ ئەوانەی كتێبیان دراوەتێ، بهێنیەوە، هەر شوێن ڕووگەكەت ناكەون، وە تۆش شوێنكەوتەی ڕووگەی وان نابیت، وە ئەوانیش شوێنكەوتەی ڕووگەی یەكدی نابن، وە ئەگەر گریمان پاش ئەو زانیارییەی بۆت هاتوە، بە دوای ئارەزووەكانیان بكەوی، ئەوە دڵنیابە لە ستەمكاران دەبی ﴿١٤٥﴾)).

## شیکردنەوەی هەندێك لە وشەكان

(قِبْلَةً): واتە، ڕووگە، ئەو شوێنەی كە ئینسان ڕووی تێدەكات، یان بەرەو ڕووی دەوەستێ، (والقِبلَةُ في الأصْلِ: اسْمٌ لِلحَالَةِ الّتی عَلَیهَا المُقَابِلُ نحو: الجِلْسة) واتە: لە ڕیشەدا وشەی (القِبلَةُ) ناوە بۆ ئەو حاڵەتەی كە ئەو كەسەی لە بەرانبەر تۆیە لەسەریەتی وەك وشەی (الجِلْسة)، (القِبلَة)ش لەسەر ئەو كێشەیە (وَفي التَّعَارُفِ صَارَ اسْماً لِلْمَكَانِ المُقَابِلِ والمُتَوَجَّهِ إلیه لِلصَّلاَة)، واتە: لە زاراوەی شەرعدا (قِبلَةَ)، ناوە بۆ ئەو شوێنەی كە ڕوو بەڕووی كەسێك، وە بۆ ئەو شوێنەی كە بۆ نوێژ ڕووی تێدەكرێ.

(وَسَطًا): (وَسط الشَّيءِ: مَالَهُ طَرَفَان مُتَسَاوِیَا القَدَرِ، وَالوَسط تَارَةً یُقَالُ فِیمَا لَهُ طَرَفَانِ مَذْمُومَانِ)، واتە: (وَسط)ی هەرشتێك، بریتیە لەوە كە ئەو شتە دوولای هەبن، هەر دوولای وەك یەكبن، بەڵام جاری واش هەیە وشەی (وَسط) مەرج نیە تەنیا بۆ شتی بەرهەست و ماددیی بەكاربێ، بەڵكو بۆ شتی مەعنەوییش بەكاردێت، كە بریتیە لەوە هەرشتێك ئەملاولای خراپ بن، بۆ وێنە: (شَجَاعَة)، ئازایەتیی، تێیەڕاندنی پێی دەگوترێ (تَهَوُّر) سەركێشی، وە بەزایەدانی پێ دەگوترێ: (جُبْن) ترسنۆكیی. دیارە هەم (تَهَوّر)و هەم (جُبْن) خراپن و نێوە ناڕاستەكەیان كە (شَجَاعَة) چاكە، یان بۆ وێنە: سەخاوەت باری پێچەوانەی بریتیە لە دەستبڵاویی (إسراف)و باری كورت هێنانیشی بریتیە لە چرووكیی (بُخل)و، نێوە ڕاستەكەی كە سەخاوەتە، چاكە، وە هەروەها زۆر لە سیفەتەكان بەم شێوەیەن، عەرەب دەڵێن: (هَذَا أَوْسطهُم حَسَبَاً: إذَا كَانَ في وَسط قَوْمِهِ)، لە زمانی عەرەبیدا دەڵێن: (هَذَا أَوْسطهُم حَسَبَاً)، واتە: لە هەموویان پلەو پایەی بەرزترە، لەنێو قەومەكەی خۆیدا، وە وشەی (وَسط) بەكاردێت بۆ هەرشتێك كە زیادڕۆیی تێدانەبێ و كورت هێنانیشی تێدانەبێ و پێی مەدح بكرێ، وە لەو ڕووەوە وەك وشەكانی:

(سـواء)،و (عَـدْل) وایە.

(يَنقَلِبُ ): (قَلْـبُ الشَّـيء: صَرْفُهُ عَن وَجْهٍ إِلـى وَجْـهٍ كَقَلْـبِ الثَّوْبِ، والإِنقِـلاَبُ: الإِنصِرَافُ)، وشەی (يَنقَلِب)، واتە: هەڵدەگەڕێتەوە، (قَلْبُ) بریتیە لە گۆڕینو لادان لە ڕوویەکەوە بۆ ڕوویەکی دی، (إِنقِلاَبُ): واتە: لادانو ڕوو وەرگێڕان.

(عَقِبَيْهِ ): (مُثَنَّـى)ی (عَقِب)ە، (عَقِب)، واتـە: پاژنـەپێ، وە دەشـگوترێ (عَقِبْ) کۆیەکـەی (أَعْقَـاب) وەك لـە فەرموودەیەکـدا پێغەمبـەر ﷺ فەرموویـەتی: {(وَيـلٌ لِلأَعْقَـابِ مِنَ النَّـار) (رَوَاهُ البُخاري برقم: (٦٠)، عَنْ عَبْدِ اللهِ بن عَمْرٍو رضي الله عنه}، واتە: سـزای سـەخت بۆ ئەوانەی کە لە کاتی دەست نوێژدا پاژنە پێیان ناشۆن، کاتێ پێغەمبـەر ﷺ ئـەوەی فـەرموو، کـە هەنـدێ لـە هـاوەڵان دەسـت نوێژیان شۆردبوو، بەڵام پاژنە پێیان نەشـۆردبوو.

(إِيمَـٰنَكُمۡ ): (إِيْمـان) واتە: (بڕوا) ئیمانو عەقیدە، بـەڵام لێـرەدا بـەواتای نوێـژ دێ، یـان بـە واتـای کـردەوە دێ، بـەڵام لەسـەر ڕای زۆربـەی لـە توێـژەرەوان لێـرەدا مەبەسـت (نوێـژ)ە، بـەڵام وشـەی ئیمـانی بـۆ بەکارهێنـراوە تـاکو بـزانرێ کـە نوێژ بەشـێکە لە ئیـمان.

(لَرَءُوفٌ ): (رَأَفَ بِهِ رَحِمَهُ أَشَدُّ الرَّحمَة) ئەگەر بگوترێ: (رَأَفَ بِه) واتـە: بـەزەیی پێداهـات، بەزەییەکی زۆر (وَعَطَفَ عَلَيهِ)، واتە: پەرۆشی بوو.

(رَّحِيمٌ )، واتە: بەخشـندە، بە بەزەیـی.

(تَقَلُّبَ وَجۡهِكَ )، واتە، ڕوو وەرگێڕانتو ڕوو لـە ئاسمانـدا گێڕانـت، پێغەمبـەر ﷺ چاوەڕێی وەحی دەکرد بۆ ئەوەی ئەو قیبلەیەی کـە بـەدڵی بـوو، کـە کەعبەیـە خوا فەرمانی پێ بکات: ڕوو لـەوێ بکـە ! جا تەماشـای ئاسمـانی دەکـرد، داخـۆ کەنگـێ وەحی بۆ دێ !

(فَلَنُوَلِّيَنَّكَ )، واتە، بە تەئکید ڕووت پێ وەردەگێڕین بەرەو ئەو شوێنە.

(**شَطْرَ**): (شَطْرُ الشَّيءِ: نِصْفُهُ وَوَسَطُهُ)، واتە: نیوەی شت و نێوە ڕاستی شت، وە لێرەدا کە دەفەرموێ: ﴿ شَطْرَ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ ﴾، واتە: ڕووبکەنە نێوەڕاستی مزگەوتی حەرام، یاخود ڕووبکەنە لای مزگەوتی حەرام. (أي جِهَتُهُ وَنَحْوُهُ)، واتە لای مزگەوتی حەرام و بەرەو ڕووی ئەو.

(**ءَايَةٍ**): لێرەدا دەفەرموێ: ﴿ وَلَئِنْ أَتَيْتَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلْكِتَٰبَ بِكُلِّ ءَايَةٍ ﴾، واتە: ئەوانەی کە کتێبیان پێدراوە، ئەگەر هەموو ئایەتێکیان بۆ بێنی ڕوو لە قیبلەی تۆ ناکەن، (آيَةٍ) لێرە بەمانای بەڵگە دێت، چونکە وەك چۆن لە ئەسڵدا بە مانای بەڵگە دێ، وە بە مانای نیشانەش دێ، بە مانای موعجیزەش دێ.

## هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتەکان

١- هۆی هاتنەخوارەوەی ئەم ڕستەیەی کە دەفەرموێ: ﴿ سَيَقُولُ ٱلسُّفَهَآءُ مِنَ ٱلنَّاسِ مَا وَلَّىٰهُمْ عَن قِبْلَتِهِمُ ٱلَّتِي كَانُواْ عَلَيْهَا ﴾، لەوبارەوە چەند فەرموودەیەك هەن:

**أ- یەکێکیان:**

{(عَن البَرَاءِ ﵁ أنَّ رَسُولَ الله ﷺ صَلَّى إلى بَيْتِ المَقْدِس ستة عَشَر شهراً أو سَبْعَةَ عَشَرَ شهراً، وكَانَ رَسُولُ الله ﷺ يُعْجِبُهُ أن تَكُونَ قبلَتُهُ قِبَلَ البَيْتِ، وَأنَّهُ صَلَّى أولَ صلاها صَلاةَ العَصْرِ وَصَلَّى مَعَهُ قَوْمٌ، فَخَرَجَ رَجُلٌ مِمَّن كَانَ صَلَّى مَعَهُ فَمَرَّ عَلَى أهل المَسجِدِ وَهُمْ رَاكِعُون، قَالَ: أشهدُ بِاللهِ لَقَدْ صَلَّيْتُ مَعَ النَبِيِّ ﷺ قِبَلَ مَكَّةَ، فدَارُوا كَمَا هُمْ قِبَلَ البَيْتِ) (رَوَاهُ البُخَارِيُّ برقم: (٤٤٨٦))}، واتە: (بەڕاء ) کە یەکێکە لە هاوەڵان ڕەزای خوای لێبێ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ کە چوو بۆ مەدینە شازدە یاخود حەڤدە مانگ ڕووی دەکردە (بیت المقدس) {کە لە فەلەستینە} بۆ نوێژ، بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ حەزی دەکرد کە قیبلەکەی کەعبە بێ {ماڵی خوا کە ئیبراهیم دروستی کردوە} وە یەکەمین نوێژێك کە پێغەمبەر ﷺ کردی،

دوای ئەوەی کە ڕووی پێ وەرسووڕێنرا بەرەو مەککە، نوێژی ئێوارە (عصر) بوو، ئێوارە کۆمەڵێك لە خزمەتیدا نوێژیان کرد، یەکێك لەو پیاوانەی کە نوێژی لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ کردبوو بەلای مزگەوتێکی دیکەدا {کە ئێستا پێی دەگوترێ مزگەوتی (ذُوالقِبلَتَين) دوو قیبلەی هەن، بەلای خەڵکی ئەو مزگەوتەدا} تێپەڕی کە لە ڕکووع دابوون، گوتی: من شایەدیی دەدەم بە خوا کە لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ نوێژی (عصر)م کرد، ڕووی لە مەککە بوو {واتە: قیبلە گۆڕدراوە، ئەوان دیارە نوێژەکەیان تۆزێك درەنگتربوو} ئەوانیش یەکسەر لە شوێنی خۆیانەوە ڕووی خۆیان وەرسووڕاند بەرەو مەککە، {دیارە ئیمامەکەیان هاتۆتە ئەو لاوە، چونکە لە مەدینە (بيت المقدس)و کەعبە ڕاست پێچەوانەی یەکترن، یەکیان لای ڕاستو ئەوی دیکە لای چەپ}.

**ب-** ئەمەش فەرموودەیەکی دیکەیە کە (ابن عمر) هەر لە بارەوە دەیگێڕێتەوە:
{(عَن ابْنُ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا، قَالَ: بَيْنَمَا النَّاسُ في صَلاَةِ الصُّبْحِ بقُبَاءٍ، إذْ جَاءَهُمْ آتٍ، فَقَالَ: إنَّ رَسولَ اللهِ ﷺ قَدْ أُنْزِلَ عَلَيهِ اللَّيْلَةَ، (قُرآنٌ) وَقَدْ أُمِرَ أنْ يَستقبِلَ الكَعْبَةَ فَاستقبلُوهَا، وكَانَتْ وُجُوهُهُمْ إلى الشَّامِ، فاستَدَارُوا إلى الكَعْبَةِ) (رَوَاهُ البُخَارِيُّ برقم: (٤٠٣)، وَمُسْلِم برقم: (١١٧٨)، وَالنَّسَائِيُّ برقم: (٧٤٤)، وَاللفْظُ لِمُسْلِم}، واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر خوا لە خۆیو بابی ڕازی بێ دەڵێ: کاتێك خەڵك لە مزگەوتی (قُباء) نوێژی بەیانیان دەکرد، یەکێك هاتە لایان گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ دوێنێ شەو قورئانی بۆ هاتۆتەخوارو فەرمانی پێکراوە کە ڕوو بکاتە کەعبە، ئێوەش ڕووی تێبکەن، دەڵێ ڕوویان لە کەعبە کرد[1].

---

١) دیارە لەنێوان فەرموودەکەی (براء)و (ابن عمر) جۆرێك لە تێکگیران هەیەو لابردنی تێکگیرانەکەش بەوە دەبێ کە بگوترێ: وادیارە مزگەوتی (قباء)و ئەو مزگەوتەی دیکە کە (براء) باس دەکات دوو مزگەوتی جیاواز بوونو، وادیارە ئەهلی مزگەوتی (قباء) زووتر لە ئەهلی ئەو مزگەوتەی دیکە بەو گۆڕانەیان زانیوە، هەروەها دەبێ بشگوترێ نابی یەکەم نوێژ دوای گۆڕانی قیبلە نوێژی ئێوارە (عصر) بووبێ، بەڵکو نوێژی بەیانی بووە، بەڵام وادیارە (براء) وایزانیوە، یان دەبێ بڵێین: یەکێك لەو دوو هاوەڵە بەڕێزە بەهەڵەدا چووە.

٢- هـۆی هاتنـەخوارەوەی ئـەو ئایەتـەی کـە دەفـەرموێ: ﴿ وَمَا كَانَ اللَّهُ لِيُضِيعَ إِيمَانَكُمْ إِنَّ اللَّهَ بِالنَّاسِ لَرَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴾، {(عَنِ الْبَرَاءِ وَكَانَ الَّذي مَاتَ عَلَى الْقِبْلَةِ قَبْلَ أَنْ تُحَوَّلَ قِبَلَ الْبَيْتِ، رِجَالٌ قُتِلُوا، لَمْ نَدْرِ مَا نَقُولُ فِيهِم، فَأَنْزَلَ اللهُ: ﴿ وَمَا كَانَ اللَّهُ لِيُضِيعَ إِيمَانَكُمْ إِنَّ اللَّهَ بِالنَّاسِ لَرَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴾) (رَوَاهُ الْبُخَارِي بِرَقم: (٤٤٨٦))}، واتە: (بەڕاء) دەڵێ: ئێمە کەسێك کە مردبوو کاتێك کە ڕوومان لە (بیت المقدس) دەکرد {لە ماوەی ئەو شازدە، حەڤدە مانگەدا} هەندێك پیاو کوژران {لە جەنگی بەدردا}، ئێمە نەماندەزانی لەبارەی وانەوە چی بڵێین، لە هەندێك ڕیوایەتی دیکەدا هاتوە دەڵێ کە کەسوکاریان دڵتەنگ بوون، گوتیان: ئەوانە کاتێك مردوون، یان کوژراون نوێژەکانیان پێ ڕوو نەکردوّتە کەعبەو ڕوویان لە (بیت المقدس) کردوە، دەبێ حاڵیان چۆن بێت ؟ ئیدی خوای کاربەجێ ئەم ڕستەیەی ناردە خوارێ: ﴿ وَمَا كَانَ اللَّهُ لِيُضِيعَ إِيمَانَكُمْ ﴾، واتە: خوا ئیمانی ئێوە زایە ناکات، کە لێرەدا مەبەست پێی نوێژەکەیانە، چونکە نوێژ بەشێکە لە ئیمان، بەڵکو گەورەترین کردەوەی ئیمانە.

## مانـای گشـتی ئایەتەکـان

لەم ئایەتانەدا خوا ﷻ باسی مەسەلەی گەورەو هەستیار دەکات کە کاتی خۆی کاردانەوەو قسەوباسی زۆری بەدوای خۆیدا هێناوە، ئەویش مەسەلەی گۆڕینی قیبلەیە، خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ سَيَقُولُ السُّفَهَاءُ مِنَ النَّاسِ مَا وَلَّاهُمْ عَن قِبْلَتِهِمُ الَّتِي كَانُوا عَلَيْهَا ﴾، (نەفامان لە خەڵکی) مەبەست پێی لێرەدا جوولەکەو نەصرانیی یەکان و هاوبەش پەیداکەرەکانە، بەپێی سیاقی ئایەتەکان و بەپێی ئایەتەکانی پێشێ و دوایی، چونکە ئەوان بوون ڕەخنەیان دەگرت لە ئەوە کە بۆچی پێغەمبەر ﷺ ڕووی بەرەو کەعبە وەرسووڕاندوە؟ جا خوا دەفەرموێ: ئەوانەی نەفامن لە خەڵکی

ڕەخنە دەگرن دەڵێن: چ شتێك وای لێکردن واز لە ڕووگەی پێشیان بێنن و {کە (بیت المقدس) بوو} ڕوو لە ڕووگەیەکی دیکە بکەن {کە (کعبة)یە} ؟!.

﴿ قُل لِّلَّهِ ٱلْمَشْرِقُ وَٱلْمَغْرِبُ ﴾، تۆ پێیان بڵێ: ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا هی خوان، واتە: خوا ﷻ خاوەنی هەموو شتێکە، تا دوێنێ فەرموویەتی: ڕوو لە (بیت المقدس) بکەن، لەمەو دوا دەفەرموێ: ڕوو لە کەعبە بکەن، ﴿ يَهْدِى مَن يَشَآءُ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴾، هەرکەسێ بیەوێ خوا ڕێنمایی دەکات بەرەو ڕاستەشەقام و ڕاستە ڕێی خۆی، کە یەکێك لەو شتانەی کە ڕاستە ڕێی خوا دەیخوازێ، ئەوەیە کە قیبلەی کۆتایی، وە قیبلەی یەکجارەکی ئۆممەتی موحەممەد ﷺ، ئەو ماڵە بێ کە ئیبراهیم دروستی کردوە، کە یەکەمین ماڵی خوا بووە لەسەر زەوی بنیات نراوە، پاشان دەفەرموێ: ﴿ وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَٰكُمْ أُمَّةً وَسَطًا لِّتَكُونُوا۟ شُهَدَآءَ عَلَى ٱلنَّاسِ ﴾، واتە: وەك چۆن ئەو قیبلەیەمان بۆ دیاری کردن، کە پلەیەکی مامنێوەندییە، چونکە نەصرانیی یەکان ڕوویان لە ڕۆژهەڵات دەکرد، وە جوولەکەکان ڕوویان لە ڕۆژئاوا دەکرد، بەڵام خوا ﷻ فەرمووی: ڕوو لە کەعبە بکەن، کە بەنسبەت هەردووکیانەوە دەکەوتە نێوانی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاواوە، جا دەفەرموێ: بەهەمان شێوە ئێوەمان کردوە بە ئۆممەت و کۆمەڵێکی میانە، کە نە تێدەپەڕێنن نە کورتی دێنن، ﴿ لِّتَكُونُوا۟ شُهَدَآءَ عَلَى ٱلنَّاسِ ﴾، بۆ ئەوەی کە بەسەر خەڵکەوە چاودێربن، یاخود بەڵگەبن، یاخود شایەدبن چاودێربن و نەیەڵن بەشەرییەت لابدات، وە بەڵگەبن بەسەریانەوە بەڵگەی ڕاست و دروستی دینی خوا بن، یاخود شایەدبن بەسەریانەوە بۆ قیامەت، کە ئەوان دینی خوایان بە ڕێك و ڕاستیی بە مرۆڤایەتی ڕاگەیاندوە ﴿ وَيَكُونَ ٱلرَّسُولُ عَلَيْكُمْ شَهِيدًا ﴾، وە بۆ ئەوە کە پێغەمبەریش بەسەر ئێوە وە بەهەمان شێوە، چاودێرو بەڵگەو شایەد بێت، ﴿ وَمَا جَعَلْنَا ٱلْقِبْلَةَ ٱلَّتِى كُنتَ عَلَيْهَآ إِلَّا لِنَعْلَمَ مَن يَتَّبِعُ ٱلرَّسُولَ مِمَّن يَنقَلِبُ عَلَىٰ عَقِبَيْهِ ﴾، دەفەرموێ: ئەو قیبلەیەی کە پێشتر لەسەری بووی {کە (بیت

المقدس)ە}، دامانەنابوو مەگەر بۆ ئەوە کە بۆمان دەربکەوێ بزانین، {واتە: لە مەیدانی واقیعدا بۆمان دەربکەوێ، ئەگەرنا خوا هەردەزانێ، بەڵام بە زمانی حاڵو واقیعی خەڵك بۆمان دەربکەوێ} کێ بەدوای پێغەمبەر ﷺ دەکەوێو کێش لێی جیادەبێتەوەو هەڵدەگەڕێتەوە لەسەر پاژنە پێیەکانی {و بە قسەی پێغەمبەری خوا ناکات}؟ ﴿ وَإِن كَانَتْ لَكَبِيرَةً إِلَّا عَلَى ٱلَّذِينَ هَدَى ٱللَّهُ ﴾، هەرچەندە ئەو {ڕووکردنە (بیت المقدس)}ە، یاخود ئەو ڕوو پێ وەرسووڕاندنە بەرەو کەعبە، شتێکی قورسو گرانو زەحمەت بوو، مەگەر لەسەر دڵی ئەوانەی کە خوا ڕێنمایی کردوون، ﴿ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُضِيعَ إِيمَٰنَكُمْ ﴾، وە خوا ئیمانی ئێوەو ئەو نوێژەتان کە لە ئیمانەکەتانەوە هەڵدەقوڵێ بەزایەی نادات، {واتە: ئەو نوێژانەی کە بەرەو (بیت المقدس) کردووتانن} ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ بِٱلنَّاسِ لَرَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴾، بێگومان خوا بەرانبەر بە خەڵکی یەکجار بە پەرۆشو بە بەزەییو بەخشندەیە، ئنجا دەفەرموێ: ﴿ قَدْ نَرَىٰ تَقَلُّبَ وَجْهِكَ فِى ٱلسَّمَآءِ ﴾، زۆر لە زانایانو توێژەرەوانی قورئان دەڵێن: ئەم ئایەتە پێش ئەوانی پێشێ هاتۆتە خوارێ، بەڵام لە ڕیزبەندییەکەیدا پێغەمبەر ﷺ بە فەرمانی خوا ئەوانی دیکەی خستۆتە پێشەوە، چونکە دوای ئەوەی کە ڕوویان لە (بیت المقدس) وەرسووڕاندوە بەرەو کەعبە، ئنجا نەفامان کەوتوونەتە ڕەخنەگرتنو قسەو قاڵ[1]، خوای کاربەجێ

١) بەڵام ئێستا قەناعەتم وایە ڕایەکی دیکە ڕاستترەو ئەو ئایەتانە ڕیزبەندییەکەی ئێستایان چۆنە، هاتنەخوارەوەکەشیان هەروا بووە، چونکە کە خوا لە یەکەمین ئایەتدا فەرموویەتی: ﴿ سَيَقُولُ ٱلسُّفَهَآءُ مِنَ ٱلنَّاسِ ... ﴾ کەواتە: بەرلەوەی نەفامان قسە بکەنو قیبلە بگۆڕێ ئەم ئایەتە هاتۆتەخوارێو خوا پێشوەخت هەواڵی بە مسوڵمانان داوە، کە نەفامەکان لەسەر گۆڕینی قیبلە کاردانەوەو هەڵوێستیان دەبێ!

بەڵام ئەوکاتە دەبێ بڵێین: خوای کاربەجێ بەرلەوەی مسوڵمانان بپرسن لەبارەی حاڵو وەزعی ئەوانەیان کە پێش گۆڕانی قیبلە مردوون یان کوژراونو ئەو نوێژانەی بەرەو لای (بیت المقدس) کردوویانن، وەڵامی ئیشکالو پرسیارەکەی نێو دڵو مێشکیانی داوەتەوە، نەك دوای پرسیار کردنیان، وەك لە حاڵەتەکانی دیکەدا باو بووە.

دەفەرموێ: ﴿ قَدْ نَرَىٰ تَقَلُّبَ وَجْهِكَ فِي ٱلسَّمَآءِ ﴾، ئێمە ڕووگێڕانی تۆ بەرەو ئاسمان دەبینین، پێغەمبەر ﷺ ڕووی لە ئاسمان دەکردو چاوەڕێی دەکرد کەنگێ وەحی بۆ دێ، فەرمانی پێبکرێ، کە بەرەو کەعبە ڕوو وەرسووڕێنێ ﴿ فَلَنُوَلِّيَنَّكَ قِبْلَةً تَرْضَىٰهَا ﴾، بە تەئکید ئێمە ڕووت پێ دەکەینە ڕووگەیەك کە دڵ پەسندی خۆتەو پێت خۆشە، ﴿ فَوَلِّ وَجْهَكَ شَطْرَ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ ﴾، کەواتە یەکسەر ڕووبکە لای مزگەوتی حەڕام {کە لە دەوری کەعبەیە}، ﴿ وَحَيْثُ مَا كُنتُمْ فَوَلُّواْ وُجُوهَكُمْ شَطْرَهُۥ ﴾، وە ئەوە تایبەت نیە بەتۆوە، بەڵکو خۆتو ئەوانەش کە شوێنکەوتووی تۆنو ئۆممەتی تۆن، لە هەرکوێیەك بوون لە هەر شوێنێك بوون ڕووبکەنە لای مزگەوتی حەڕامو ڕووبکەنە کەعبە، ﴿ وَإِنَّ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلْكِتَٰبَ لَيَعْلَمُونَ أَنَّهُ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّهِمْ ﴾، وە بێگومان ئەوانەی کتێبیان پێدراوە، دەزانن ئەوە هەقەو لە پەروەردگاریانەوەیە، چونکە دەیانزانی کە موحەممەد ﷺ پێغەمبەری کۆتایی خوا، ڕووگەکەی بریتیە لە کەعبە، کەواتە: دەیانزانی هەردەبێ ڕۆژێك ئەو ڕووگەیە بگۆڕدرێ، ئەوە یەك.

پاشان لە کتێبەکانیاندا هەبوو کە پێغەمبەری کۆتایی ڕوو دەکاتە دوو ڕووگان، سەرەتا ڕوو دەکاتە (بیت المقدس)و، دوایی ڕوو دەکاتە ئەو کەعبەیەی کە لە مەککەیە ﴿ وَمَا ٱللَّهُ بِغَٰفِلٍ عَمَّا يَعْمَلُونَ ﴾، وە خوا بێئاگا نیە لەوەی کە دەیکەن، لەو پیلانو فێڵو پڕوپاگەندەو ئیشە خراپەی کە دەیکەن، لە حاڵێکیشدا کە دەزانن ئەوانە لەسەر ناهەقن، وە پێغەمبەر ﷺ لەسەر هەقەو ڕاست دەکات. ﴿ وَلَئِنْ أَتَيْتَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلْكِتَٰبَ بِكُلِّ ءَايَةٍ مَّا تَبِعُواْ قِبْلَتَكَ ﴾، ئنجا پێغەمبەر ﷺ دڵنیا دەکاتەوەو دەفەرموێ: ئەگەر ئەوانەی کتێبیان پێدراوە، هەموو بەڵگەیەکیان بۆ بێنیتەوە، بەدوای ڕووگەی تۆ هەرناکەونو ڕووناکەنە ڕووگەکەی تۆ، ﴿ وَمَآ أَنتَ بِتَابِعٍ قِبْلَتَهُمْ ﴾، وە بە تەئکید تۆش شوێنکەوتووی ڕووگەی وان نیو تۆش

ناگونجێ و لێت ناوەشێتەوە ﴿ وَمَا بَعْضُهُم بِتَابِعٍ قِبْلَةَ بَعْضٍ ﴾، وە ئەوانەی کتێبیان پێدراوە، هەندێکیشیان ڕوو ناکەنە ڕووگەی هەندێکیان، نە جوولەکە ڕوو لە هی نەصرانیی یەکان دەکەن و، نە نەصرانیی یەکان ڕوو لە هی جوولەکە دەکەن، نە صابیئە ڕوو لە هی وان دەکەن، وە هەروەها ...هتد.

﴿ وَلَئِنِ ٱتَّبَعْتَ أَهْوَآءَهُم مِّنۢ بَعْدِ مَا جَآءَكَ مِنَ ٱلْعِلْمِ ۙ إِنَّكَ إِذًا لَّمِنَ ٱلظَّـٰلِمِينَ ﴾، وە بە تەئکید ئەگەر تۆ بەدوای ئارەزووی وان بکەوی دوای ئەوەی زانیارییت بۆ هاتوە، {واتە: زانیاری وەحی و شەریعەت}، بێگومان تۆ لە ستەمکاران دەبی، چونکە کەسێك زانیاری وەحی بۆبێ کە زانیارییەکی جێی دڵنیایی یەو زانیارییەکی یەقینییە، زانیاری لە خواوە بۆبێ و بکەوێتە شوێن ئارەزووی خەڵکی دیکە، ئەوە بە تەئکید ستەمێکی گەورەی لە خۆی و لە شەریعەتی خوا کردوەو، لەسەر ئەوەش دیارە تووشی سزاو جەزرەبە دەبێ، هەڵبەتە خوا دەزانێ کە بە تەئکید پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر لەوە دوور بووە (وەك دوای باسی دەکەین)، بەڵام ئەوە بۆ ئەوە بووە کە خەڵکی دیکە بزانێت لادان لە زانیاری وەحی، کە بەرەو ئارەزووی خەڵکێکی دیکە، تاوانێکی وایە کە هەرگیز لێبوردن نایگرێتەوە.

## چەند مەسەلەیەکی گرنگ

**مەسەلەی یەکەم:** کە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ سَيَقُولُ ٱلسُّفَهَآءُ مِنَ ٱلنَّاسِ مَا وَلَّىٰهُمْ عَن قِبْلَتِهِمُ ٱلَّتِى كَانُوا۟ عَلَيْهَا ﴾، ئەمە لێی وەردەگیرێ کە تەنیا کەسانێك ڕەخنە لە یاساکانی شەرع و لە فەرمانەکانی خوا دەگرن، کە نەفام و گەوج و بێ عەقڵ بن، بەڵام خەڵکی عاقڵ و تێگەیشتوو دەزانێ خوای پەروەردگاری خەڵکی، هەرچی بیفەرموێ هەمووی حیکمەتەو عەینی ڕاستییەو، بەرژەوەندیی و خێرو چاکەیە بۆ دنیاو دوارۆژی خەڵکی، وە لێرەدا مەبەست لە نەفامەکان، جوولەکەو نەصرانیی یەکان و هاوبەش بۆ خوا دانەرەکانن، چونکە ئەو سێ

کۆمەڵە بوون کە لە کاتێکدا پێغەمبەر ﷺ قیبلەکەی بۆ گۆڕدراوە، دەستیان کردوە بە بانگەشەی خراپو ڕەخنەگرتن.

**مەسەلەی دووەم:** ئۆممەتی پێغەمبەر ﷺ وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَٰكُمْ أُمَّةً وَسَطًا ﴾، ئێوەمان کردوە بە کۆمەڵێکی میانەو میانجیی، واتە: نە تێدەپەڕێنن نە کورتی دێنن، نە (إفرَاط) یان هەیەو نە (تَفْرِيط) جا ئۆممەتی ئیسلام لە هەموو شتێکدا هەر میانەن‌و خەتی نێوە ڕاستیان گرتوە:

١) لە ڕووی عەقیدەوە: لە نێوانی (إلحادُ و شِرك)دان. واتە: نەوایە کە دان بە خوادا نەهێنن، نەواشە کە دان بە چەند پەرستراوێك دا بێنن، بەڵکو دەڵێن: خوا هەیە، بەڵام یەك خوایەو دەبێ هەر ئەویش بپەرسترێ.

٢) وە لە ڕووی سیفەتەکانی خواوە: لەنێوان جەستاندن‌و داڕووتاندان، نە ئەوەیە کە سیفەتەکانی خواو ناوەکانی خوا، وەك هی دروستکراوەکانی تەماشا بکەن‌و خوا (تَجْسيم وتَشْبِيه) بکەن‌و، نەواشە کە سیفەتەکانی لێ دابڕنن، بەڵکو سیفاتەکانی بۆ ئیسپات دەکەن، بەڵام لەگەڵ بە پاك گرتندا.

٣) وە بەنسبەت پێغەمبەرانەوە (علیهم الصلاة والسلام): نەوایە کە کوفر بە پێغەمبەران بکەن‌و نەواشە کە بیانپەرستن، جوولەکەکان کوفریان بە پێغەمبەران دەکرد، بەڵکو هەندێکیان هەر لێ‌کوشتوون[1]، وە نەصرانیی یەکان (عیسا)یان کردە پەرستراوی خۆیان، بەڵام ئۆممەتی ئیسلام ڕێزی تەواو بۆ پێغەمبەران دادەنێن، بەڵام نایانپەرستن، وە هیچ بێ ئەدەبییەکییشیان بەرانبەر ناکەن.

٤) وە لەڕووی هەڵوێستیان لە بەرانبەر دنیادا: نە دنیا پەرستیی دەکەنە پیشەو نە گۆشەگیریی، بەڵکو دنیا وەك وەسیلەیەك‌و وەك تاقیگەیەك تەماشا دەکەن، وە لەقەدەر خۆی بایەخی پێدەدەن، واتە: ئەوەنیە کە گوریسی لەبن

---

١) وەك پێشتر لە: (الكتاب المقدس)ەوە نەقڵمان کرد، لە هەرکام لە: (العهد القديم) و (العهد الجديد)دا.

ڕابخەن، وە ئەوەش نیە کە دەستبەرداریشی بن و، وازی لێ بێنن و گۆشەگیریی هەڵبژێرن.

٥) وە لەنێوانی ماددەو ڕووحدا: نە ئەوەیە زێدەڕۆیی بکەن لە ماددە پەرستییداو، نە ئەوەیە بەلای گرتنی ڕووح و ئیهمالکردنی ماددەدا بشکێنەوە، بەڵکو هەر کام لە ماددەو ڕووح دەگرن و، هەر شتە بەقەدەر خۆی بایەخی پێ دەدەن.

٦) لە نێوان تاک و کۆمەڵدا: نە تاک بە قوربانی کۆمەڵ دەکەن، وەك لە کۆمەڵگای سۆسیالیستییەکاندا دەبینرا، وە نە کۆمەڵگاش بە قوربانی تاك دەکەن، وەك لە کۆمەڵگا سەرمادارییەکانداو لەژێر سایەی سیستەمی لیبرالیزم و سەرمایەدارییدا دەبینرێ.

**مەسەلەی سێیەم:** ئەو ڕستە قورئانییە کە دەفەرموێ: ﴿لِّتَكُونُوا۟ شُهَدَآءَ عَلَى ٱلنَّاسِ﴾، بۆ ئەوەی شایەدبن بەسەر خەڵکەوە، لە مانای گشتی ئایەتەکان باسمان کرد، کە مەبەست لە (شهدآء) کە کۆی (شهید)ە، یان کۆی (شاهِد)ەو هەردووکیشیان بەمانای (چاودێر)و بەمانای (بەڵگە)و بەمانای (شایەدیی دەر)یش دێن، واتە: کەسێك کە شایەدیی دەدات، جا خوا ﷻ باسی ئەوە دەکات کە ئۆممەتی پێغەمبەر ﷺ (شهدآء)ن، بەسەر مرۆڤایەتییەوەو، لەوبارەوە ئەم فەرموودەیە هەیە: {(عَنْ أَنَس رضي الله عنه قَالَ: مُرَّ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ بِجَنَازَةٍ فَأَثْنَوا عَلَيْهَا خَيْراً، فَقَالَ النَّبِيّ ﷺ وَجَبَتْ وَجَبَتْ وَجَبَتْ، وَمُرَّ بِجَنَازَةٍ فَأَثْنَوا عَلَيْهَا شَرّاً فَقَالَ: النَّبِيّ ﷺ وَجَبَتْ وَجَبَتْ وَجَبَتْ، فَسَأَلَهُ عُمَرَ رضي الله عنه قَالَ: مَنْ أَثْنَيتُمْ عَلَيهِ خَيْراً وَجَبَتْ لَهُ الجَنَّةَ، وَمَن أَثْنَيتُمْ شَرّاً وَجَبَتْ لَهُ النَّار، أَنْتُمْ شُهَدَاءُ اللهِ فِي الأَرض) (رَوَاهُ البُخَارِيُّ بِرقم: (٢٦٤٢)، وَمُسْلِم بِرقم: (٢١٩٧)، وَالنَّسَائِيُّ برقم: (١٩٣١)، وَاللَّفْظُ لِمُسْلم}، {(وَزَادَ الحَكِيم التِّرمِذِيُّ ثُمَّ تَلاَ رَسُولُ الله: ﴿وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَٰكُمْ أُمَّةً وَسَطًا لِّتَكُونُوا۟ شُهَدَآءَ عَلَى ٱلنَّاسِ﴾)}. واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ: ڕۆژێك

جەنازەیەکیان هێنا {دیارە لەو شوێنە کە پێغەمبەر ﷺ وەستاوە کۆمەڵێك لە هاوەڵانی لێ‌بوون}، خەڵك مەدحی ئەو خاوەن جەنازەیان کرد، گوتیان: ئینسانی باش بوو، پێغەمبەر ﷺ سێ جاران فەرمووی: پێویست بوو، پێویست بوو، پێویست بوو، دوای ماوەیەك جەنازەیەکی دیکەیان هێنا، خەڵکەکە کە لێی وەستابوون بە خراپە باسیان کرد، دیسان پێغەمبەر ﷺ سێ جاران فەرمووی: پێویست بوو، پێویست بوو، پێویست بوو، عومەر خوا لێی ڕازی بێ لەوبارەوە، پرسیاری لێکرد فەرمووی: ئەوەی کە ئێوە مەدحتان کردو بە چاکە باستان کرد، بەهەشتی بۆ پێویست بوو، ئەوەش کە بە خراپە باستان کرد، ئاگری بۆ پێویست بوو، چونکە ئێوە شایەدییدەرانی خوان، {یاخود ئێوە بەڵگەی خوان} ﷻ، وە (الحَكِيم التِّرمِذِيُّ) لەم فەرموودەیەدا ئەوەندەشی زیادکردوە لە ڕیوایەتی خۆیدا کە دەڵێ: دوای ئەوە کە پێغەمبەر ﷺ ئەوەی فەرموو، ئێوە شایەدیی دەرانی خوان لەسەر زەوی، ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿ وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَٰكُمْ أُمَّةً وَسَطًا ﴾، ئەمەش ئەوەی لێوەردەگیرێ کە میانەیی ئۆممەتی پێغەمبەر ﷺ وە ڕاست و ڕەوایان و پابەندییان بە خەتی نێوە ڕاستەوە، لە هەموو شتێکدا وە تێ نەپەڕاندنیان و بەزایەنەدانیان، ئەوەیە وایان لێدەکات شایستەیی ئەوەیان هەبێت، کە چاودێربن بەسەر مرۆڤایەتییەوەو بەڵگەبن لەسەر ئەوە کە ئایین و بەرنامەی تێرو تەواوی خوا تەنیا ئیسلامە، ئەها ئەو کۆمەڵە مسوڵمانەی بەرهەم هێناوە ! کەواتە: هەر ئیسلام ڕاستە، یاخود شایەدی خوابن بەسەر خەڵکەوەو شایەدیی بدەن بۆ ڕاستێتی ئیسلام، یاخود شایەدیی پێغەمبەران بن ﷺ بەسەر ئۆممەتەکانیانەوە، وەك ئەم فەرموودەی دوایی هەرسی واتاکە دەگرێتەوە: {(عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُدْعَى نُوحٌ يَوْمَ الْقِيَامَةِ فَيُقَالُ لَهُ هَلْ بَلَّغْتَ؟ فَيَقُولُ: نَعَمْ، فَيُدْعَى قَوْمُهُ، فَيُقَالُ لَهُمْ هَلْ بَلَّغَكُمْ؟ فَيَقُولُونَ مَا أَتَانَا مِنْ نَذِيرٍ، قَالَ فَيُقَالُ لِنُوحٍ: مَنْ يَشْهَدُ لَكَ فَيَقُولُ: مُحَمَّدٌ وَأُمَّتُهُ قَالَ فَذَلِكَ قَوْلُهُ: ﴿ وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَٰكُمْ أُمَّةً وَسَطًا ﴾، قَالَ: الْوَسط الْعَدْلُ: قَالَ فَتُدْعَوْنَ فَتَشْهَدُونَ

بِالْبَـلاَغِ وَأَشْـهدُ عَلَيْكُـمْ) (أَخْرَجَـهُ أَحْمَـد بـرقم: (١١٢٢٢)، وَالبُخَـارِيُّ بـرقم: (٣٣٣٩)، وَالتِّرمِـذِيُّ بـرقم: (٢٩٥٩)، وَقَـالَ: حَـسَنٌ صَـحِيحٌ، وَالنَّـسَائِيُّ فـي (الكُبـرى) بـرقم: (١١٠٠٧)، وَابْـنُ مَاجَـهْ بـرقم: (٤٢٨٤)، وَابْـنُ حِبَّـانَ بـرقم: (٦٤٧٧)}، واتە: ئەبو سەعیدی خودریی خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ڕۆژی قیامەت نووح ﷵ بانگ دەكرێ پێی دەگوترێ: ئایا تۆ پەیامی خوات ڕاگەیاندوە؟ دەڵی: بەڵێ، گەلەكەی بانگ دەكرێن، پێیان دەگوترێ، ئایا نـووح پـەیامو بەرنامـەی خـوای پـێ ڕاگەیانـدوون؟ دەڵـێن: هـیچ (پێغەمبـەرو) ترسێنەرێكمان بۆ نەهاتوە، بە نووح دەگوترێ: كێ شایەدییت بۆ دەدا؟ كە تۆ پەیامی خوات پێ ڕاگەیاندوون؟ ئـەویش دەڵێ: موحەممـەدو ئۆممەتەكەی، جا پێغەمبەر ﷺ فـەرمووی: ئەوەیـە كـە خـوا دەفـەرموێ: ﴿ وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَٰكُمْ أُمَّةً وَسَطًا لِّتَكُونُوا۟ شُهَدَآءَ عَلَى ٱلنَّاسِ ﴾، واتە: ئاوا بەو شێوەیە ئێوەمان گێڕاوە بە بەڵگەو شایەد بەسـەر خەڵـكەوە كـە پێغەمبـەران پێیـان ڕاگەیانـدوون، ئنجـا فـەرمووی: (الوَسـط: العَـدْل)، واتـە: (وسـط) یـانی: ڕێـكو پێـك (فَـتُدْعَوْنَ فَتَشـهدُونَ بِالبَلاغ)، ئنجا بانگ دەكرێنو شایەدیی بۆ دەدەن، كە پەیامی خـوای پێڕاگەیانـدوون. (دەڵـێن ئێمـە شـایەدینو ئیـسپاتكەری ئـەوەین، كـە نـووح بـە گەلەكـەی خـۆی ڕاگەیانـدوە، (وَأَشْـهدُ عَلَيكُـم)، وە منـیش شـایەدییتان لەسـەر دەدەم كە پێم ڕاگەیاندوون، واتە: پێغەمبـەر ﷺ شایەدە بەسـەر ئۆممەتەكـەی خۆیەوەو ئۆممەتەكەیشی شایەدن بەسـەر ئۆممەتەكانی دیكـەوە.

چـۆن شـایەدن؟ چـونكە ئۆممـەتی پێغەمبـەر ﷺ دەڵـێن: خـوا لـە ڕێگـای موحەممـەدەوە پێـی ڕاگەیانـدووین لـە ڕێـی قورئانـەوە، كـە نـووح گەلـی خـۆی ئاگاداركردۆتـەوە، هـەروەها هـەموو پێغەمبـەران گـەلانی خۆیانیـان ئاگـادار كردۆتەوە، پێغەمبەری خواش ڕاستی فەرمووە، كەواتە: پێغەمبـەران كـە دەڵـێن میللەتانی خۆمان ئاگاداركردۆتەوە، ڕاسـت دەكەنو ئێمە شـایەدیی دەدەیـن، كـە پێغەمبەران ڕاسـتگۆن.

**مەسەلەی چوارەم:** کە دەفەرمویٚ: ﴿ وَمَا جَعَلْنَا ٱلْقِبْلَةَ ٱلَّتِي كُنتَ عَلَيْهَآ إِلَّا لِنَعْلَمَ مَن يَتَّبِعُ ٱلرَّسُولَ مِمَّن يَنقَلِبُ عَلَىٰ عَقِبَيْهِ ﴾، واتە: ئەو قیبلەیەی کە پێشتر لەسەری بووی، هەر بۆیە دامان نابوو تاکو ئەوەی کە بە دوای پێغەمبەر ﷺ دەکەوێ {لە هەردوو حاڵەتەکاندا هەم بۆ ڕووکردنە (بیت المقدس)و هەم بۆ ڕووکردنە کەعبە} لەوە جیابێتەوە کە لەسەر پاژنەکانی هەڵدەگەڕێتەوەو هەم بۆ ڕووکردنە (بیت المقدس) بە قسەی ناکات، هەم بۆ ڕووکردنە کەعبەش بە قسەی ناکات، شایانی باسە ئەم ڕستە قورئانییە سێ شتی لێ وەردەگیرێن:

١/ سوننەتیش هەر وەحی خوایە، چونکە زانایان لەسەر ئەوە مەیلەو یەك دەنگن کە پێغەمبەر ﷺ بە قورئان فەرمانی پێنەکراوە کە ڕووبکاتە (بیت المقدس)، بەڵکو بە وەحی دیکە کە وەحی سوننەتە، فەرمانی پێکراوە ڕوو بکاتە (بیت المقدس)، خواش ﷻ لێرەدا ڕووکردنە (بیت المقدس)ی بەهی خۆی داناوە، وەك دەفەرمویٚ: ﴿ وَمَا جَعَلْنَا ٱلْقِبْلَةَ ٱلَّتِي كُنتَ عَلَيْهَآ ﴾، واتە: ئێمە ئەو قیبلەیەی کە پێشتر لەسەری بووی نەمانگێڕابوو بە ڕووگەی تۆ، کەواتە: دیارە ئەویش خوا فەرمانی پێکردووەو مانای وایە ئەوەش کە پێغەمبەر ﷺ لەڕێی سوننەتەکەیەوە دەیفەرمویٚو دەخاتەڕوو، خوا هەر بە فەرمانی خۆی دەزانێ.

٢/ وە ئەوەشی لێ وەردەگیرێ کە قورئان سوننەت نەسخ دەکاتەوە، وەك لە دەرسەکانی ڕابردوودا لە باسی (نَسْخ)دا باسمان کرد، بەڵام قورئان تەنیا بە قورئان (نَسْخ) دەبێتەوەو بە سوننەت (نَسْخ) نابێتەوە، هەرچەندە ئەم مەسەلەیە لەنێو زانایاندا ڕاجیاییو مشتومڕی تێدایە، بەڵام زۆرینەی وەك: شافیعیو مالیكو ئەحمەدو سوفیانی ثەوریی (ڕەزاو ڕەحمەتی خوایان لێبێت)، وە زۆرێکی دی لە زانایان، ڕایان وایە کە قورئان تەنیا بە قورئان (نَسْخ) دەبێتەوە، سوننەت قورئانی پێ (نَسْخ) نابێتەوە[1]، وە ئەم

---

١) بڕوانە: (توضيح المشكلات من كتاب الورقات المشهور بشرح المحلّي على الورقات) لجلال الدين المَحلّي، ص: (٨٢٨، ٢٨٣): (ولا يجوز نسخ الكتاب بالسنَّة وهو غير واقعٍ، فلا

مەسەلەیەی ئەم قیبلە گۆڕینە بە قورئان، لە حاڵێکدا کە پێشتر پێغەمبەر ﷺ بەپێی سوننەت ڕووی لە (بیت المقدس) کردوە، نموونەیەکە لە نەسخ کرانەوەی سوننەت بە قورئان.

٣/ هەروەها ئەم ڕستە قورئانییە ئەوەشی لێ وەردەگیرێ، کە خوای کاربەجێ بەندەکانی خۆی بە چەندان طاعەت تاقی دەکاتەوە، جارێك دەفەرموێ: ڕوو لەوێ بکەن جارێکی دیکە دەفەرموێ: ڕوو لەوێ بکەن، جارێك بە شتی خۆش و جارێك بە شتی ناخۆش، چونکە کافرەکانی مەککە دیارە کەعبەیان زۆر لەلا پیرۆز بووەو، مسوڵمانانیش کە مسوڵمان بوون، کەعبەیان زۆر لەلا پیرۆز بووە، بۆیە کاتێك پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموون: ڕوو بکەنە (بیت المقدس) بۆ نوێژەکانتان، لەسەر دڵیان زۆر قورس بووە، مانای وایە خوا ﷻ بە شتێکی تاقیکردوونەوە، کە لەسەر دڵیان قورس بووەو طاعەتیش بوو بۆ خوا ! کەواتە: مەرج نیە ئینسان تەنیا ئەو شتەی پێی خۆشە طاعەت بێ، وە جاری واش هەیە شتێکت زۆر پێخۆشەو خواش پێی خۆشەو فەرمانی خوایە، بۆ وێنە: کە خوا فەرمووی: ڕووبکەنەوە کەعبە زۆریان پێ خۆشبوو، پێش هەموویان پێغەمبەر ﷺ، کە ئەمەش دیسان فەرمانی خوا بوو !

**مەسەلەی پێنجەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ وَإِن كَانَتْ لَكَبِيرَةً إِلَّا عَلَى ٱلَّذِينَ هَدَى ٱللَّهُ ﴾،

واتە: ڕووکردنە (بیت المقدس) یاخود ڕوو وەرسووڕاندنەوە بۆ کەعبە، یاخود هەردووکیان، ئەو مەسەلەیە زۆر قورس و گران و بەزەحمەت بوو، مەگەر لەسەر ئەوانەی کە خوا هیدایەتی دابوون و ڕێنمایی کردبوون، ئەمە چی لێ وەردەگیرێ ؟ ئەوەی لێ وەردەگیرێ کە بەڕاستی هەرکاتێك هیدایەتی خوا، لە دڵ و دەروونی ئینساندا باش جێگیر بووو، ئینسان بەڕاستی ئیمانی لە دڵدا سەقامگیر بوو، فەرمانەکانی خوای هەموو لەسەر شان سووك دەبن،

---

یُنسَخ القرآن بالسنَّة، سواء كانت متواترةً أو آحاداً ...)، واتە: وە ناگونجێ قورئان بە سوننەت نەسخ بکرێتەوە وە شتی وا ڕووی نەداوە، بۆیە قورئان بە سوننەت نەسخ نابێتەوە، ئەو سوننەتە موتەواتیر بێ، یان ئاحاد...

بۆیە خوا کە باسی مونافیقەکان دەکات، دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ يُخَٰدِعُونَ ٱللَّهَ وَهُوَ خَٰدِعُهُمْ وَإِذَا قَامُوٓا۟ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ قَامُوا۟ كُسَالَىٰ ...﴿١٤٢﴾﴾ التوبة، واتە: مونافیقەکان دەیانەوێ خوا فریو بدەن، بەڵام خۆیان فریو دەدەن، وە کاتێك بۆ نوێژێ هەڵدەستن بە تەنبەڵیی و تەوەزەلیی هەڵدەستن، هەروەها دەربارەی ماڵ سەرف کردنیان، دەفەرموێ: ﴿... وَلَا يُنفِقُونَ إِلَّا وَهُمْ كَٰرِهُونَ ﴿٥٤﴾﴾ التوبة، واتە: ماڵی خۆیان نابەخشن، مەگەر بە پێناخۆشبوونەوە، بۆچی؟ چونکە ئیمانیان لە دڵدا نیەو هیدایەتی خوایان لە دڵدا نیە، بۆیە فەرمانبەریی خوایان لەسەرشان گرانەو لەسەر دڵ قورسە. بەڵام کاتێ ئینسان خوا هیدایەتی دەخاتە نێو دڵ، جێبەجێکردنی فەرمانەکانی خوای لەسەر دڵ سووك دەبێت، جا ئەوە پێوەرو تەرازوویە، بۆ هەموو ئینسانێك با خۆی بخاتە ئەو تەرازووەوە، ئایا فەرمانەکانی خوات لەسەر دڵ سووکن و پێت خۆشن و پێیان مورتاحی، یان لەسەر دڵت قورسن و وەك بێگارت پێ بکەن؟ ئەگەر وەك بێگارە، بە خوا بزانە ئیمان و هیدایەتەکەت زۆر ناتەواوە، یان هەر نیتە، وە ئەگەر لەسەر شانت خۆشەو پێی مورتاحی و دڵت پێی ئاسوودەیەو، بە قالب سووکیی و بەدڵ خۆشیی جێبەجێی دەکەی، ئەوە دڵت بەخۆت خۆشبێ، إن شاء الله ئیمانەکەت باشەو خوای بەرز هیدایەتی خستۆتە نێو دڵتەوە، ئەوە پێوەرێکە خوای کاربەجێ بۆی داناوین.

**مەسەلەی شەشەم:** ئەوە کە خوای تاك دەفەرموێ: ﴿وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُضِيعَ إِيمَٰنَكُمْ﴾ بەڵگەی ئەوەیە کە نوێژ بەشێکە لە ئیمان، وە فراوانتر بڵێین کردەوە بەشێکی پێکهێنەری ئیمانە، وەك ئێمە لە چەند دەرسێکی ڕابردوودا ئاماژەمان بەوە کرد، کە ئیمان لە چوار شت پێکدێت، بۆ نموونە: ئیمان بە خوا ﷻ:

**پێکهێنەری یەکەمی ئیمان بە خوا:** بە عەقڵ خوا بناسی، وەك بۆخۆی خۆی پێ ناساندووین لە قورئان و سوننەتدا، بەو ناوو سیفەتانەی خۆی پێناساندووین، خوا بناسی بەو شێوەیە کە تەنیا ئەوە پەروەردگارتەو،

تەنیا ئەوە بەدیهێنەرتەو، تەنیا ئەو خاوەنتەو، تەنیا ئەو پەرستراوتە، ئاوا بیناسین، ئەوە یەك.

**پێکهێنەری دووەمی ئیمان بە خوا:** ئەوەیە کە ئەوەی بە عەقڵ زانیوتە، بە دڵ قەبووڵی بکەی، واتە: بە دڵ خوات خۆشبوێو لەلات گەورەبێ، لەلات لە هەموو کەسێ گەورەتربێو بەڕێزتربێو خۆشەویستتر بێتو لێی بترسێیو بۆی ملکەچ بی، وە هەرچی خوا فەرموویەتی بە دڵ وگیان قەبووڵت بێ.

**پێکهێنەری سێیەمی ئیمان بە خوا:** بریتیە لە دانپێداهێنانی زمان، ئەوەی کە بە عەقڵ وەرتگرتوەو بە دڵ قەبووڵت کردوەو سەلماندووتە، بە زمانیش ئامادەبی دانی پێدا بێنی.

**پێکهێنەری چوارەمی ئیمان بە خوا:** ئەوەیە کە ئەوەی ڕابردوو بە ئەندامەکانت جێبەجێی بکەی.

جا نوێژ بۆیە خوا ناوی لێناوە ئیمان، چونکە هەم پەیوەندی بە عەقڵەوە هەیەو، هەم پەیوەندی بە دڵەوە هەیەو، هەم پەیوەندی بە زمانەوە هەیەو، هەم پەیوەندی بە جەستەوە هەیە، واتە: لەڕاستیدا نوێژ باشترین بەرجەستەکەری ئیمانە، بە هەر چوار پێکهێنەرەکەیەوە، بەشێکی پەیوەندی بە عەقڵو هۆشەوە هەیە، ئەویش ئەوەیە کە تۆ ئایەتەکان دەخوێنی زیکرەکان دەخوێنی، تەحییات دەخوێنی، دەبێ بیری لێ بکەیەوەو بە عەقڵ تێیبگەیو فەهمی بکەی، پاشان بەشێکی پەیوەندی بە دڵەوە هەیە، ئەویش ئەوەیە کە تۆ تەفاعول بکەی لەگەڵ ئەو نوێژو زیکرو قورئان خوێندنو تەحییاتەداو، تەفاعولی لەگەڵدا بکەی بەدڵو گەورەییو بەرزییو پاکیی خوا لە دڵی خۆتدا ئامادە بکەی، ئنجا بە زمانیش ئەوە دیارە کە ئایەتەکان دەخوێنی زیکرەکان دەخوێنی، وە دواییش ئەوەیە کە بەهەموو جەستەت دەچیە ڕکووعو کڕنووشو ڕادەوەستی، وە دەچیە تەحییاتو... هتد.

**مەسەلەی حەوتەم:** ئەوەیە کە خوا ﷻ مەبەستی بووەو مەبەستیەتی پێغەمبەری خۆی ڕازی بکات، واتە: شتێك کە پێغەمبەر ﷺ پێی خۆش بووبێ، مادام پەرچ و مانعێکی لەبەردەمدا نەبووبێ، خوا پێی خۆشبووە کە بۆی جێبەجێکات، بە بەڵگەی ئەوە کە دەفەرموێ: ﴿ فَلَنُوَلِّيَنَّكَ قِبۡلَةٗ تَرۡضَىٰهَاۚ ﴾، واتە: ڕووت پێ وەردەسووڕێنین بەرەو ڕووگەیەك کە پێت خۆشەو دڵ پەسەندیی خۆتە، کەواتە: خوا ﷻ پێی خۆشبووە شتێك بۆ پێغەمبەر ﷺ بکات کە پێی خۆش بووەو پێی مورتاح بووە، وەك بە ڕاشکاوییش فەرموویەتی: ﴿ وَلَسَوۡفَ يُعۡطِيكَ رَبُّكَ فَتَرۡضَىٰٓ ۝٥ ﴾ الضحى، واتە: وە لەمەودوا پەروەردگارت پێتدەبەخشێ و ڕازی دەبی.

**مەسەلەی هەشتەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ وَإِنَّ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ لَيَعۡلَمُونَ أَنَّهُ ٱلۡحَقُّ مِن رَّبِّهِمۡۗ وَمَا ٱللَّهُ بِغَٰفِلٍ عَمَّا يَعۡمَلُونَ ﴾، ئەوانەی کە کتێبیان دراوەتێ دەزانن هەق لە پەروەردگاریانەوەیە، چۆن دەزانن؟ ئەوانەی کتێبیان دراوەتێ، بە پلەی یەکەم مەبەست پێیان جوولەکەو نەصرانیی یەکانە، کە هەر ئەو دوو کۆمەڵە لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ بوون، بەڵام هەر کۆمەڵێکی دیکەش خۆیان بە خاوەن کتێبی ئاسمانی بزانن، هەر دەیانگرێتەوە[1]، جا ئایا خاوەن کتێبەکان چۆن دەزانن کە ئەو قیبلەیە کە پێشتر (بیت المقدس) بووەو دوایی بۆتە کەعبە، ئەوە هەقەو لە پەروەردگاریانەوە؟ بە دوو بەڵگان:

**بەڵگەی یەکەم:** لەبەرئەوەی مادام خوا خاوەنی هەموو شتێکەو هەموو کەسێکە، خوا هەقی تەواوی خۆیەتی کە ڕۆژێ بفەرموێ: ڕوو لەوێ بکەن و دوایی بفەرموێ: ڕوو لە شوێنێکی دیکە بکەن و، کەسیش بۆی نیە ڕەخنەی لێ

---

١) هەرچەندە ڕای دیکەش هەیە، کە تەنیا جوولەکەو نەصرانیی خاوەن کتێبن، بەڵام ئەوە ڕاست نیەو (أهل الكتاب)، (الذين أوتوا الكتاب) چەمك و واتایەکی فراوانەو وێڕای جوولەکەو نەصرانییەکان، خۆ بە خاوەن کتێبی ئاسمانییەکانی دیکەش دەگرێتەوە.

بگرێ، وەك فەرموویەتی: ﴿ لَا يُسْـَٔلُ عَمَّا يَفْعَلُ وَهُمْ يُسْـَٔلُونَ ﴿٢٣﴾ ﴾ الأنبياء، واتە: (خوا) پرسیاری لێناکرێ لەوەی کە دەیکاتو ئەوان پرسیاریان لێ دەکرێ، چونکە خوا پەروەردگارو خاوەنە، وە پاشان جگە لە خاوەنداریێتیو پەروەردگارێتی، خوا زاناو کاربەجێیەو هیچ شتێك ناکات لە جێی خۆی نەبێو، کەسێك ڕەخنەی لێ دەگیرێ، کە دەست بداتە ئیشێك هی خۆی نەبێو تەصەرڕوف لە شتێکدا بکات کە موڵکی خۆی نەبێ، یاخود بە شێوەیەك تەصەرڕوف بکات، کە پێچەوانەی حیکمەتو لێزانین بێ، بەڵێ خوا کاربەجێیەو هیچ شتێك ناکات لە شوێنی خۆیدا نەبێ، کەواتە: هیچ کەس مافی ئەوەی نیە ڕەخنەی لێ بگرێ.

**بەڵگەی دووەم:** لە کتێبە پێشووەکاندا هاتوە، کە پێغەمبەری کۆتایی موحەممەد ﷺ جیا لە هەموو پێغەمبەرانی دیکە، دوو ڕووگەی دەبن، چونکە پێغەمبەرانی دیکە هەموویان یەك ڕووگەیان (قبلة) بووە، بەڵام لە کتێبە پێشووەکاندا هاتوە، کە پێغەمبەری کۆتایی دوو ڕووگەی دەبن، یەکیان (بیت المقدس)و لە کۆتاییشدا بە یەکجارەکی کەعبە، بۆیە خاوەن کتێبەکان، بە پێچەوانەوە ئەگەر موحەممەد ﷺ لە قۆناغی دووەمداو بۆ یەکجارەکی ڕووی لە کەعبە نەکردبایە، دوایی لێی دەکەوتنە گومانەوە، کە ئەوە پێغەمبەری خوا نیە ! چونکە لە کتێبەکانی ئەواندا هاتوە، کە ئەو پێغەمبەرە ﷺ یەکەمجار بۆ نوێژ ڕوو دەکاتە (بیت المقدس)، بەڵام بۆ دوایی بە یەکجارەکی ڕوو دەکاتە کەعبە.

**مەسەلەی نۆیەم:** کە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَلَئِنِ ٱتَّبَعْتَ أَهْوَآءَهُم مِّنۢ بَعْدِ مَا جَآءَكَ مِنَ ٱلْعِلْمِ إِنَّكَ إِذًا لَّمِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾، وە ئەگەر بەدوای ئارەزووی وان بکەوی، دوای ئەوەی کە زانیارییت بۆ هاتوە، ئەوە بێگومان تۆ لە ستەمکاران دەبی، ئەوە سێ شتی لێ وەردەگیرێ، مەبەستم ئەوەیە بەدڵنیاییی خوا زانیویەتی، کە (محمد المصطفی)یەك ﷺ، کە سەروەری

پێغەمبەرانەو، چاكترین ئینسانەو هەڵبژێردراوی نێو بەشەرییەتە، بەدوای ئارەزووی جوولەکەو نەصرانیی یەکان ناکەوێ، بەڵام بۆچی وا دەفەرموێ؟ لەبەر سێ شتان و سێ حیکمەتی تێدان:

١- بۆ ئەوەی بزانرێ کە یاساکانی خوا ﷻ، بۆ هەمووان وەك یەکن و هیچ کەس مافی (ڤیتۆی) لە بەرانبەریاندا نیە، یاساکانی خواو شەریعەتی خوا، وەك بیردۆزەو رێچکە بەشەرییەکان نین، بەدەستیانەوە وەك قوڕی صیناعی وابن، یان وەك لاستیك وابن، بە ئارەزووی خۆیان بیکێشن، یان وەك تەونی جاڵجاڵۆکە بن، یەکێك لە زانایان دەڵێ: ((قانوونی بەشەر وەك تەونی جاڵجاڵۆکە وایە مێش و مەگەزو قالۆنچەی فەقیرحاڵ و ئەوانەی دەگرێ، بەڵام زەردەواڵەو زیندەوەری هاری تێدا دەڕۆنە دەرێ))، بەڵێ شەریعەتی خوا دەبێ هەموو پێوەی پابەندبن و، هەمووان ملکەچ دەکات و، هیچ کەس هەڵاوێردراو (مُستثنَى)نیە لە پابەندیی بەشەریعەتەوەو، لە ملکەچیی بۆ یاساکانی خوادا.

٢- تاکو خەڵکی بزانن بابەتەکە زۆر جیددیی یە، واتە شوێنکەوتنی شەریعەت، جا لە مەسەلەی قیبلەدا، یان لە هەر مەسەلەیەکی دیکەدا، زۆر جیددیی یەو لە خۆیان وریابن.

٣- تاکو بزانرێ کە موحەممەد ﷺ کەم و زۆر دەستی لە یاساکانی شەرعدا نیە، واتە: لەوانەی کە خوا پێی ڕادەگەیەنێ، کەم و زۆر دەستی تێدا نین، بەڵکو ئەویش وەك پێی ڕادەگەیەنێ مولزەمە بەوە کە پێیانەوە پابەندبێ، وەك دەفەرموێ: ﴿ ثُمَّ جَعَلْنَاكَ عَلَىٰ شَرِيعَةٍ مِّنَ الْأَمْرِ فَاتَّبِعْهَا وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَاءَ الَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ ﴿١٨﴾ ﴾الجاثیة، واتە: دوایی تۆمان لەسەر بەرنامەیەك دانا، جا شوێنی بکەوەو مەکەوە شوێن ئارەزووی ئەوانەی کە نازانن، کەواتە: پێغەمبەریش ﷺ وەك هەموو مسوڵمانان، بەڵکو لەپێش هەموویانەوە زیاترو چاکتر، فەرمانی پێکراوە پابەندبێ بە شەریعەتەوە، وە پێغەمبەر ﷺ هیچ دەستی نەبووە لە یاساکاندا، کە بۆ خۆی بە ئارەزووی خۆی

دایانبنێ، ئەوەتا لە مەسەلەی ڕووکردنی (بیت المقدس) هەرچەندە زۆر لەسەر دڵی قورس بووە، بەڵام خوا فەرموویەتی ڕووبکە (بیت المقدس)، دوایی هەرچەندە زۆر تەماشای ئاسمانی کردوەو زۆر چاوەڕوانی کردوە، بەڵام فەرمانی بۆ نەهاتوە، تاکو (١٦ ، ١٧) مانگ، بەڵکو هەندێك لە زانایان دەڵێن: ئەو کاتەی کە لە مەککەش بوون هەر ڕوویان لە (بیت المقدس) کردوە، وە هەندێك دەڵێن: لەو کاتەوەکە هاتوونە مەدینە پێیان گوتراوە: ڕوو لە (بیت المقدس) بکەن، بۆ دڵ ڕاگرتنی جوولەکەکان و بۆ ئەوە کە سەرنجیان ڕابکێشرێ، بەڵکو مادام کە ڕوودەکاتە قیبلەی ئەوان، ئەوانیش دڵیان نەرم بێت بۆ ئیمان و ئیسلام، دەڵێن: حیکمەتەکەی ئەوە بووە، کەواتە پێغەمبەر ﷺ کەمەو زۆر دەستی لەو حوکمە شەرعییانەدا نەبووە، وە ئەوانی دیکەش دیارە هەمووی هەرچی یاسای شەرعییە، یان:

١) خوا ڕاستەوخۆ پێی فەرمووە، کە وەك خۆی ڕایبگەیەنێ: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلرَّسُولُ بَلِّغْ مَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ ... ﴿٦٧﴾ ﴾ المائدة، واتە: ئەی پێغەمبەر ! ئەوەی لە پەروەردگارتەوە پێت ڕاگەیەنراوە ڕایبگەیەنە.

٢) یاخود بەشێوەی وەحی ناڕاستەوخۆ، کە ئیلهامی دڵی کراوەو خراوەتە نێو دڵی.

٣) یاخود پێغەمبەر ﷺ بۆ خۆی کۆششی کردوەو یاساکانی هەڵهێنجاوە لەبەر ڕۆشنایی قورئاندا، ئەویش ئەوەی نەیپێکابێ، خوای پەروەردگار بۆی ڕاست کردۆتەوە، ئەوەش کە پێکابێتی ئەوە پشتگیریی کردوەو بۆتە بەشێك لە وەحی.

**مەسەلەی دەیەم:** زانایان باری شانیان زۆر قورسە، چونکە دەفەرموێ: ﴿ وَلَئِنِ ٱتَّبَعْتَ أَهْوَآءَهُم مِّنۢ بَعْدِ مَا جَآءَكَ مِنَ ٱلْعِلْمِ ۙ إِنَّكَ إِذًا لَّمِنَ ٱلظَّـٰلِمِينَ ﴾، واتە: وە ئەگەر بەدوای ئارەزووی وان بکەوی دوای ئەوەی زانیارییت بۆ هاتوە، ئەوە بێگومان تۆ لە ستەمکاران دەبی، کەواتە: دوای ئەوەی ئینسان زانیاری بۆ

دێو خوا شارەزای دەکاتو بەرچاوی ڕۆشن دەکاتەوە، ئەگەر بێتو بە دوای ئارەزووی خەڵکی دیکە بکەوێ، گوناهەکەیو پاشان سزاو جەزرەبەکەیشی زۆر گەورەترەو قورسترە لەوەی کە نازانێ! ئەمەش ئەوە دەردەخات کە زانایان بەڕاستی باری شانیان قورسەو ئەرکێکی زۆر گەورەیان لەسەر شانە، چونکە خەڵکی دیکە ڕەنگە کەمو زۆر مەجالی هەبێ بە هۆی نەزانییو بێ ئاگاییەوە، بەرگرییەك لە خۆی بکاتو، بڵێ نەمزانیوەو ئاگام لێ نەبووەو شارەزا نەبووم، بەڵام بابای زاناو شارەزا مەجالی ئەو (دیفاع)ەی نیە، دیارە هەموو کەسیش ناتوانێ دیفاع بکات لە خۆی بەهۆی نەزانینەوە، لە هەموو حاڵاندا، چونکە (العُذر بالجَهل) عوزر هێنانەوە بە نەزانییو بێئاگایی، ئەویش خەڵکی تایبەتی خۆی هەیەو شوێنی تایبەتی خۆی هەیە، ئەوەی کە بواری هەبێت شارەزابێ، دەبێ شارەزابێ، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿... فَسْـَٔلُوٓاْ أَهْلَ ٱلذِّكْرِ إِن كُنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴿٤٣﴾﴾ النحل، واتە: لە زانایان بپرسن ئەگەر نازانن، کەواتە: نابێ مرۆڤ لە نەزانییدا خۆی بهێڵێتەوەو بڵێ: لە قیامەتێ دەڵێم: خوایە نەمزانی، نازانی بەڵام دەتوانی بپرسی! (العُذر بالجَهل) بۆ کەسێکەو کەسێك بێئاگاییو نەزانیی بۆ دەبێتە بیانوو، کە هیچ دەرفەتو بواری نەبێ فێربێ.

<u>**مەسەلەی یازدەیەم:**</u> مەسەلەی ڕووگە مەسەلەیەکی زۆر گرنگەو یەکێکە لە دروشمەکانی ئوممەتی ئیسلام، بۆیە خوا ﷻ زۆر گرنگییو بایەخیی پێداوەو، بۆیەش نەیارانو ناحەزانی مسوڵمانان لە جوولەکەو لە نەصرانییو کافرەکانو بتپەرستەکان، زۆری پێ قەڵس بوونو پڕوپاگەندەو قسەو قاڵی زۆریان لەسەر کردوە، چونکە ئوممەتو کۆمەڵ بەوە لە خەڵکی دیکە جیادەکرێنەوە، کە ئایا ڕوو لە کوێ دەکەن؟ ئنجا بەڕاستی قیبلە هۆی کۆکردنەوەی مسوڵمانانەو هۆی یەك ڕیزییانەو هۆی یەك ڕووییانە، وە کاریگەرییەکی زۆر گەورە، هەم لە ڕووی ڕێکخستنی ژیانی سیاسیو کۆمەڵایەتییاندا دەبینێو، هەم لە ڕووی بەیەکەوە

بەستنی دڵ و دەروونیاندا، واتە: مسوڵمانان کاتێ هەست دەکەن کە هەر مسوڵمانێ لە هەر کوێیەکی دنیابێ هەر ڕوودەکاتە ئەو ماڵەی خوا ﷻ کە لە مەککەیەو، ڕوو دەکاتە ئەو ڕووگەیە کە ئیبراهیم ﵇ بنیاتی ناوەو دروستی کردوە، هەست دەکات کە لەگەڵ هەموو ئەوانەی ڕوو لەو قیبلەیە دەکەن، دۆست و هاوڕێبازەو هاوئامانجە، ئەوە دەبێتە هۆی ئەوە کە یەکڕیزییەکی عەقیدەیی و فیکریی و شعووریی لەنێوان ئۆممەتی پێغەمبەردا ﷺ دروست بێ.

خوای پەروەردگار لەو کەسانەمان بگێڕێ، کە کاتێك بەجەستە ڕوو دەکەینە قیبلە، بە دڵیش ڕوومان لە خوابێ و ڕووی نیازو مەبەستەکانمان تەنیا لە خوابێ.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی سی یەم

## پێناسـەی ئەم دەرسـە

لەم دەرسـەماندا لـە ئایـەتی ژمـارە (١٤٦ تـاكو ١٥٢) واتـە، حـەوت (٧) ئایـەت لـە سوورەتی (البقرة) تەفسیر دەكەین إن شاء الله. لەم حەوت ئایەتەدا خوا ﷻ هەر لەسەر باسی مەسەلەی گۆڕینی قیبلە لە (بیت المقدس)ەوە بەرەو كەعبە دەدوێ، وە دەربارەی ئـەوە كـە خـاوەن كتێبەكـان ئـەو مەسـەلەیان زۆر چـاك زانیـوەو دڵنیابوونـە كـە ئـەوە هەقـەو لـە پەروەردگـاریانەوەیە، بـەڵام هـەر بـە ئەنقەسـت نكووڵیی لـێ دەكـەن، هـەروەها زۆر چـاك پێغەمبـەری كۆتـایی (موحەممـەد) ﷺ دەناسـن، بەڵام هەر نایانەوێ بڕوای پێ بێنن. ئنجا خوا ﷻ ڕوو لە پێغەمبەر ﷺ وە ئیمانداران دەكاتو هەر لەوبارەوە فەرمانیان پـێ دەكات، كـە لـە هـەر شـوێنێك بوون، چ لە ماڵی خۆیان نیشتەجێ بوون، یاخود لە كاتی سەفەرو هاتنو چووندا بـوون، هـەر ڕووبكـەنە كەعبـە، وە دوایـی هەنـدێك لـە نیعمەتـەكانی خۆییـان دەخاتەوە بیـر، وە لـە كۆتاییـدا خـوا ﷻ فـەرمان بـە ئیمانـداران دەكـات، كـە یـادی بكەنو سوپاسی بكەن، تاكو خواش ﷻ یادیـان بكـات.

﴿ ٱلَّذِينَ ءَاتَيْنَٰهُمُ ٱلْكِتَٰبَ يَعْرِفُونَهُۥ كَمَا يَعْرِفُونَ أَبْنَآءَهُمْ ۖ وَإِنَّ فَرِيقًا مِّنْهُمْ لَيَكْتُمُونَ ٱلْحَقَّ وَهُمْ يَعْلَمُونَ ﴿١٤٦﴾ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكَ ۖ فَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلْمُمْتَرِينَ ﴿١٤٧﴾ وَلِكُلٍّ وِجْهَةٌ هُوَ مُوَلِّيهَا ۖ فَٱسْتَبِقُوا۟ ٱلْخَيْرَٰتِ ۚ أَيْنَ مَا تَكُونُوا۟ يَأْتِ بِكُمُ ٱللَّهُ جَمِيعًا ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿١٤٨﴾ وَمِنْ حَيْثُ خَرَجْتَ فَوَلِّ وَجْهَكَ شَطْرَ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ ۖ وَإِنَّهُۥ لَلْحَقُّ مِن رَّبِّكَ ۗ وَمَا ٱللَّهُ بِغَٰفِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ ﴿١٤٩﴾ وَمِنْ حَيْثُ خَرَجْتَ فَوَلِّ وَجْهَكَ شَطْرَ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ ۚ وَحَيْثُ مَا كُنتُمْ فَوَلُّوا۟ وُجُوهَكُمْ شَطْرَهُۥ لِئَلَّا يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَيْكُمْ حُجَّةٌ إِلَّا ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ مِنْهُمْ فَلَا

تَخْشَوْهُمْ وَٱخْشَوْنِى وَلِأُتِمَّ نِعْمَتِى عَلَيْكُمْ وَلَعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ ﴿١٥٠﴾ كَمَآ أَرْسَلْنَا فِيكُمْ رَسُولًا مِّنكُمْ يَتْلُوا۟ عَلَيْكُمْ ءَايَٰتِنَا وَيُزَكِّيكُمْ وَيُعَلِّمُكُمُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ وَيُعَلِّمُكُم مَّا لَمْ تَكُونُوا۟ تَعْلَمُونَ ﴿١٥١﴾ فَٱذْكُرُونِىٓ أَذْكُرْكُمْ وَٱشْكُرُوا۟ لِى وَلَا تَكْفُرُونِ ﴿١٥٢﴾ ﴾.

## مانای وشە بە وشەی ئایەتەکان

((ئەوانەی کتێبمان داونێ دەیناسن (واتە: موحەممەد ﷺ) وەك چۆن کوڕەکانیان دەناسن، وە دەستەیەکیان هەرچەندە دەشزانن ﴿١٤٦﴾ بەلاّم هەق دەشارنەوە، دڵنیابە هەق لە پەروەردگارتەوەیەو لە دوودڵان مەبە ﴿١٤٧﴾ وە بۆ هەر کامێك (لە ئۆممەتان) ڕووگەیەك هەیە کە ڕووی تێدەکات، دەجا پێشبڕکێ بکەن لە ئەنجامدانی چاکەکاندا، لە هەر کوێیەك بن خوا تێکڕاتان دێنێ، بێگومان خوا لەسەر هەموو شتێك بە توانایە ﴿١٤٨﴾ وە لە هەر لایەکەوە دەرچووی‌و لە هەر جێگایەك بووی، ڕوو لەلای مزگەوتی حەڕام بکە، وە دڵنیابە کە ئەوە هەقە لە پەروەردگارتەوە، وە خوا لەوەی دەیکەن بێ ئاگانیە ﴿١٤٩﴾ وە لەهەر لایەکەوە دەرچووی هەر ڕووت بکە لای مزگەوتی حەڕام‌و، لە هەر جێیەك بوون هەر ڕووی تێبکەن، تاکو خەڵکی بەڵگەی لەسەرتان نەبێ، جگە لەوانەیان کە ستەم دەکەن، لەوانیش بێباك بن‌و بەس لەمن بترسن، بۆ ئەوەی چاکەی خۆمتان لەسەر تەواو بکەم، وە بەڵکو بە تەواویی ڕێی ڕاست بگرن ﴿١٥٠﴾ وەك چۆن لە نێوانتاندا پێغەمبەرێکمان لە خۆتان ڕەوانەکردوە، کە ئایەتەکانمانتان بەسەر دەخوێنێتەوە، وە پاك‌و چاکتان دەکات‌و بەرنامەو کارامەیی تان فێردەکات، وە شتانێکتان فێردەکات کە نەدەگونجا بیانزانن ﴿١٥١﴾دە جا یادم بکەن، یادتان دەکەم‌و، سوپاسم بکەن، سپڵەییم بەرانبەر مەکەن ﴿١٥٢﴾)).

## شیکردنەوەی هەندێك لە وشەکان

(يَعْرِفُونَهُۥ): ﴿ يَعْرِفُونَهُۥ كَمَا يَعْرِفُونَ أَبْنَآءَهُمْ ﴾، واتە: دەیناسن وەك چۆن کوڕەکانی خۆیان دەناسن، هەڵبەتە لێرەدا ڕاناوەکە دەچێتەوە سەر پێغەمبەر ﷺ چونکە سیاقی ئایەتەکان دەلالەتی لەسەر دەکات، ئەگەر بەڕاشکاوییش ناوی نەهاتبێ. (المَعْرِفَةُ والعِرْفَانُ: إدرَاكُ الشَّيءِ بِتَفَكُّرٍ و تَدَبُّرٍ لأثرِهِ، وهُوَ أخَصُّ مِنَ العِلْمِ، وَيُضَادُّهُ الإنكَارُ)، واتە: (مَعرِفَةُ) بریتییە زانینی شتێك بە لێوردبوونەوەو تێوەڕامانی شوێنەوارەکەی، وە وشەی (مَعرِفَةُ) لە وشەی (عِلْم) تایبەتترە، وە پێچەوانەی (مَعْرِفَةُ) بریتییە لە نکوولّیی (إنْكَار)، بەڵام پێچەوانەی (عِلْم) بریتییە لە نەزانین (جَهْل)، بۆیە تەنیا وشەی (عِلْم) بۆ خوا بەکاردێ‌و (عِلْم) یەکێکە لە سیفاتەکانی خوا، بەڵام وشەی (مَعْرِفَة)ی بۆ بەکارنایەت، چونکە خوا شتەکان ڕاستەوخۆ دەزانێ‌و دەناسێ، نەك پێویست بەوە بکات بیریان لێ بکاتەوە، یاخود بەهۆی شوێنەوارەکانیانەوە بیانناسێ، کە ئەوە مانای (مَعْرِفَة)یە.

(ٱلْمُمْتَرِينَ): لە (مِريَةَ)دوە هاتوە (المِرْيَةُ: التَّرَدُّدُ في الأمْر، وَهُوَ أخَصُّ مِنَ الشَّكِّ)، (مرية) واتە: دڵ لە دڵدان، وە تایبەتترە لە (شَك) گومان، (وَأصلُهُ مِنْ مَرَيْتُ النَّاقَةَ: إذَا مَسَحْتَ ضَرْعَهَا)، واتە: ئەسڵی (مِرْيَةَ) لەوە هاتوە، کە دەڵێی (مَرَيْتُ النّاقَة)، واتە: گوانە حوشترەکەم دەست پێداهێنا بۆ ئەوەی کە شیری لێبێ.

(وِجْهَةٌ): (الجِهَةُ والوِجْهَةُ: المَقْصَدُ)، واتە: مەبەست، ئەو شوێنەی کە ئینسان مەبەستیەتی.

(حَيْثُ): (حَيْثُ: عِبَارَةٌ عَن مَكَانٍ مُبْهَمٍ يُشْرَحُ بِالجُملَةِ الّتي بَعْدَهُ) وشەی (حَيْثُ)، (ظَرْف مَكَان)ە، واتە: شوێنێکی نادیار کە ڕستە دواییەکەی تەفسیری دەکات.

(حُجَّةٌ): (الحُجَّةُ: الدَلاَلَةُ المُبَيّنَةَ لِلْمَحَجَّةَ، أَي: المَقْصَدُ المُستقِيم)، (حجة) بريتيه له پێشاندانێكی ڕوونكەرەوە بەرەو ئەو مەبەستەی كە بۆی دەچیٚ، وشەی (مَحَجَّةَ)ش، بە مانای مەبەستێكی ڕاستو ڕەوان دیٚ.

(وَٱشْكُرُواْ): (الشُّكْرُ: تَصَوُّرُ النِّعْمَةَ وَإظْهَارُهَا)، (شكر) بريتيه لەوە كە تۆ نیعمەت بێنیە بەرچاوی خۆتو بیخەیەڕوو، پێچەوانەی (كُفْران)ە، (وَهُوَ: نِسْيَانُ النِّعْمَةِ وَسترُهَا) بريتيه لە سپڵەیی كردن یاخود لەبیرخۆبردنەوەی نیعمەتو شاردنەوەی، دەگوترێ: (ودَابَّةٌ شَكُورٌ: أي مُظْهِرَة بِسِمَنِها إسداءَ صَاحِبِها إلَيهَا)، (دَابَّةٌ شَكُورٌ) بريتيه لە ئاژەڵێكی قەڵەو ئەو چاكەیەی كە خاوەنەكەی لەگەڵی كردوەو لەوەڕی داوەتیٚو خزمەتی كردوە لەخۆیدا نیشانی داوە، كە بريتيه لە قەڵەویی. (وَقيلَ: أصلُهُ مِن عَيْنِ شَكْرى أي: مُمتَلِئةِ)، واتە: هەندێكیش دەڵێن وشەی (الشُّكْرُ) لە (عَيْنٌ شَكْرَى)ەوە هاتوە، واتە: (عَيْنٌ مُمْتَلِئَةٌ) چاوێك كە پڕبیٚ لە فرمێسك، بابای شوكرانە بژێریش یادی نیعمەتی خوا دەكات بە دڵو بە زمانی باسی دەكاتو بە كردەوەش لەخۆیدا دەیخاتەڕووو پێشانی دەدات.

## هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتەكان

هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتەی كە دەفەرموێ: ﴿ٱلَّذِينَ ءَاتَيْنَٰهُمُ ٱلْكِتَٰبَ يَعْرِفُونَهُۥ كَمَا يَعْرِفُونَ أَبْنَآءَهُمْ ۖ وَإِنَّ فَرِيقًا مِّنْهُمْ لَيَكْتُمُونَ ٱلْحَقَّ وَهُمْ يَعْلَمُونَ﴾، {(نَزَلَتْ في مُؤْمِني أَهْلِ الكِتَابِ: عَبدِالله بْن سَلَامٍ وَأَصْحَابُهُ، كَانُوا يَعْرِفُونَ رَسولَ اللهِ ﷺ بِنعتِهِ وَصِفَتِهِ وَمَبْعَثِهِ في كِتَابِهِمْ كَمَا يَعْرِفُ أحدهُم وَلَدَهُ إذا رَآهُ في الغلمان) (أسباب النزول للنيسابوري، ص (٢٩- ٣٠)}، واتە: ئەم ئایەتە دەربارەی خاوەن كتێبەكان هاتە خوار بە تایبەتی ئەوانەیان كە بڕوایان بە پێغەمبەری خوا هێنا ﷺ وەك عەبدوڵڵای كوڕی سەلامو هاوەڵەكانی كە پێغەمبەری خوایان ﷺ

بەو سیفەتو ناوونیشانو شوێنی لێ ڕەوانەکرانەی کە لە کتێبەکەیاندا باسکرابوون، زۆر چاکیان دەناسی (و بڕوایان پێهێنا)، یەکێکیان پێغەمبەری خوای ﷺ دەناسی، کە ئەوە پێغەمبەری خوایە وەك چۆن منداڵەکانی خۆی لەنێو منداڵاندا دەناسیەوە.

وە گێڕراوەتەوە کە عومەری کوڕی خەتتاب خوا لێی ڕازی بێ بە عەبدوڵڵای کوڕی سەلامی گوتوە: (أتَعرِفُ مُحَمَّداً كَمَا تَعْرِف ولدَك؟)، واتە: ئایا موحەممەد ﷺ دەناسی وەك چۆن کوڕی خۆت دەناسی؟ ئەویش گوتوویەتی: بەڵێ زیاتریش لە کوڕەکەم موحەممەد دەیناسم، کە پێغەمبەری خوایە، چونکە خوا بە ئەمینی ئاسمانێدا کە بریتیە لە جبریل ناردوویەتی بۆ ئەمینی سەر زەوی، کە موحەممەدە ﷺ نیشانەکانی هەموو لە کتێبەکانی ئێمەدا هاتوون لەبەر ئەوە من زیاتر لەوەی کە دەزانم کوڕەکەم کوڕی منە، دەزانم کە موحەممەد پێغەمبەری خوایە ﷺ، زۆربەی تەفسیرەکان ئەو پرسیارەو وەڵامەی نێوان عومەرو عەبدوڵڵای کوڕی سەلامیان هێناوە خوا، لە هەردووکیان ڕازی بێ[1].

## مانای گشتی ئایەتەکان

خوا ﷻ (وەك لە دەرسی پێشوودا باسمان کرد) ئەوەی خستەڕوو کە ڕووکردنی پێغەمبەر ﷺ و ئوممەتەکە سەرەتا بۆ قیبلەی یەکەمیان، کە بریتیە لە مزگەوتی (أقصَى)و (بيت المقدس) کە لە فەلەستینە لە شاری (قودس)، وە دواتر بەرەو قیبلەی دووەمیان کە کەعبەیەو لە مەککەیە، خوا ﷻ باسی کرد، کە ئەوان زۆرچاك دەزانن کە ئەوە لە پەروەردگاریانەوەیە، چونکە لە کتێبەکانیاندا

---

١) کە ئەمە دەقەکەیتی: {روي عن عمر أنه قال لعبدالله بن سلام: أتَعرف محمداً كما تعرفُ وَلَدكَ؟ قال: نعم وأكثر، نزل الأمينُ من السماء على الأمين في الأرض بنعته فَعَرفتُهُ، وإني لا أدري ماكان من أمّه، فَقَبَّلَ عُمَرُ رأسَهُ) أورده الواحدي في أسباب نزول/ ٧٥ ، باب (٣٩). و ذكره السيوطي في (الدر المنور) (١/١٤٧)}. بڕوانە: (الجامع لأحكام القرآن) للقرطبي، ج: (٢)، ص (١٤٤)، وە (محاسن التأويل)، ج: (١)، ص: (٣٧٢).

هەبووە کە پێغەمبەری کۆتایی ڕوو لە دوو قیبلان دەکات، جیا لە هەموو پێغەمبەرانی دیکە ﷺ کە یەك ڕووگەیان بووە، بەڵام پێغەمبەری کۆتایی دوو ڕووگەی دەبن، یەکیان (بیت المقدس)ەو ئەویدیکە کەعبەیە، ئنجا دێتە سەرباسی ئەوە کە زانینی ئەوە کە موحەممەد ﷺ پێغەمبەری خوایە، وە ناسینی موحەممەد ﷺ بە سیفەتەکانیو پێناسەکانی کە لە کتێبەکانی پێشووی خوای پەروەردگاردا هەن، کە بۆ پێغەمبەران ناردوونیو ئەوە شتێکی زۆر زانراو بووە لای زانایانی ئەهلی کیتاب، دەفەرمویٚ: ﴿ٱلَّذِينَ ءَاتَيۡنَٰهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ يَعۡرِفُونَهُۥ كَمَا يَعۡرِفُونَ أَبۡنَآءَهُمۡ﴾ ، ئەوانەی کتێبیان پێدراوە هەموویان هەم جوولەکەکان هەم نەصرانیی یەکان، وە هەم ئەهلی کتێبی دیکە، وەك صابیئەو زەردەشتیی، هەموو ئەوانە بەبێ هەڵاواردن دەیناسن (واتە: موحەممەد ﷺ) وەك چۆن کوڕەکانی خۆیان دەناسن، واتە دەزانن کە موحەممەد پێغەمبەری کۆتایی خوایە، چونکە خوا ﷻ هیچ پێغەمبەرێکی نەناردوە، مەگەر پێی ڕاگەیاندوە، کە ئۆممەتەکەت ئامۆژگاریی بکە ئەگەر وەچەکانیان مان، لە کۆتایی زەمانو ڕۆژگاردا، پێغەمبەری کۆتایی دێتو هەموو بەشەرییەت لەسەر ئیمان هێنان بەو پێغەمبەری کۆتایی یە کۆدەبێتەوە، وەك خوا ﷻ لەوبارەوە کە پەیمانی لە هەموو پێغەمبەران وەرگرتوە، کە ئۆممەتەکانی خۆیان ڕاسپێرن ئیمان بە پێغەمبەری کۆتایی بێنن کە موحەممەدە ﷺ، فەرموویەتی: ﴿وَإِذۡ أَخَذَ ٱللَّهُ مِيثَٰقَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ لَمَآ ءَاتَيۡتُكُم مِّن كِتَٰبٖ وَحِكۡمَةٖ ثُمَّ جَآءَكُمۡ رَسُولٞ مُّصَدِّقٞ لِّمَا مَعَكُمۡ لَتُؤۡمِنُنَّ بِهِۦ وَلَتَنصُرُنَّهُۥۚ قَالَ ءَأَقۡرَرۡتُمۡ وَأَخَذۡتُمۡ عَلَىٰ ذَٰلِكُمۡ إِصۡرِيۖ قَالُوٓاْ أَقۡرَرۡنَاۚ قَالَ فَٱشۡهَدُواْ وَأَنَا۠ مَعَكُم مِّنَ ٱلشَّٰهِدِينَ ﴿٨١﴾﴾آل عمران، واتە: یادبکەنەوە کاتێك خوا پەیمانی لە هەموو پێغەمبەران وەرگرت، پێی فەرموون: بەهۆی ئەوەوە کە من کتێبو حیکمەتم پێتان داوە، دوایی ئەگەر پێغەمبەرێك هات کە ئەوەی لەگەڵ ئێوەیە لە کتێبی خواو لە بەرنامەی خوا، بەڕاستی دەزانێ، دەبێ ئیمانی پێبێنن‌و سەری بخەن، پێی فەرموون: ئایا دانتان پێدا هێنا لەسەر ئەوەی بەڵێنتان بەمندا ؟ گوتیان: بەڵێ

ئەوە دانمان پێداهێنا فەرمووی: دە ئێوە شایەدبن بەسەر ئۆممەتەکانتانەوە، وە منیش لەگەڵ ئێوەدا لە شایەدانم، دیارە خوا ﷻ زانیویەتی کاتێك کە پێغەمبەری کۆتایی دێ، ئەو پێغەمبەرانە هیچیان نامێنن، بەڵام مەبەست ئۆممەتەکانیانەو شوێن کەوتووەکانیانە، بۆ ئەوەی هیچ خاوەن بەرنامەیەکی ئاسمانییو هیچ خاوەن کتێبێك برو بیانوو نەهێنێتەوە، بڵێ: من لەسەر بەرنامەی خۆمو لەسەر کتێبی خۆم دەمێنمەوە، ئەوەتا هەموو پێغەمبەران ئەو پەیمانەیان لێ وەرگیراوەو کراونە شایەدو بەڵگە بەسەر ئۆممەتەکانیانەوە، بۆیە خوای بە بەزەیی دەفەرموێ: ئێوە شایەدبن منیش لەگەڵ ئێوە لە شایەدانم، کە هەمووتان ئەو بەڵێنو پەیمانەتان داوە، کە دەبێ ئەو پێغەمبەرەی هەموو بەشەر لەسەری کۆدەبنەوەو، ئیمانی پێ دێننو، پێغەمبەری هەموو بەشەریەتە تا کۆتایی دنیا، موحەممەد ﷺ بێ پاشان دەفەرموێ: ﴿وَإِنَّ فَرِيقًا مِّنْهُمْ لَيَكْتُمُونَ ٱلْحَقَّ وَهُمْ يَعْلَمُونَ﴾، واتە: کەچی دەستەیەكو کۆمەڵێك لە خاوەن کتێبەکان هەق دەشارنەوە، لە حاڵێکیشدا کە دەزانن ئەوە هەقەو دەبووایە ئەو هەقە ڕابگەیەنن، بەڵام دەیشارنەوە، لە (صحیح)ی بوخارییدا هاتوە: (صَفِيَّة) کە دوایی دەبێتە خێزانی پێغەمبەر ﷺ دەگێڕێتەوە دەڵێ: بابم و مامم {واتە: (حُيَيّ بْنِ أَخْطَب)و (أبو یاسر)ی برای ڕۆژێك بەیانی زوو دەرچوون، گوتیان: بابچین بزانین ئایا موحەممەد ئەو وەسفو پێناسانەی لە کتێبەکانی ئێمەدا هاتوون بەسەر ویدا دەچەسپێنو پێغەمبەری خوایە یان نا ؟ (صَفِيَّة) دەڵێ: بابمو مامم چوون، {دیارە ئەوکاتە کچ بووە لە ماڵی بابی دا بووە}، وە ئێوارە درەنگانێ هاتنەوە بە لۆژە لۆژ، زۆر ماندوو بوو بوون مامم بە بابمی گوت، ڕات چۆنە پێت وایە موحەممەد ڕاست دەکات پێغەمبەری خوایە یان نا ؟ دەڵێ، گوتی: بەڵێ بە تەئکید هەوە، گوتی ئەدی هەڵوێستمان چی بێ ؟ ئیمانی پێ دێنی یان نا ؟ دەڵێ (حُيَيّ) گوتی: هەتا دەمرم دژایەتی دەکەم! واتە: چۆن من ئیمان بە پێغەمبەرێك دێنم کە لە غەیری بەنی ئیسرائیل هاتوە، ئێمە چاوەڕێمان دەکرد پێغەمبەری کۆتایی لە بەنی ئیسرائیل بێ، کەچی لە عەرەبانە! بەڵێ ئەوە

کە ئەهلی کیتاب زانیویانە موحەممەد ﷺ پێغەمبەری خوایە، ئەوان زۆر بۆیان ئاشکرا بووە، ڕەنگە ئەهلی کیتابی ئێستا بەو پلەیە بۆیان ئاشکرا نەبێ چونکە کتێبەکانیان زۆر گۆڕیوە، بەڵام وەك دوایی باسی دەکەین، ئێستاش لە پەیمانی کۆن (العهد القديم)دا، دەقی واماوە کە بە ئاشکراو بە ڕوونیی بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە باسی پێغەمبەری خاتەم کراوە ﷺ، دوایی خوا دەفەرموێ: ﴿ ٱلۡحَقُّ مِن رَّبِّكَ فَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلۡمُمۡتَرِينَ ﴾، واتە: هەقو ڕاستییو ئەو قسەیەی کە لەگەڵ واقیعدا ڕاست دێتەوە، تەنیا لە پەروەردگارتەوەیە، دەجا لە دوو دڵان مەبە، دیارە لێرەدا ڕووی دواندن (خطاب) لە پێغەمبەرە ﷺ، بەڵام بە پلەی یەکەم شوێنکەوتووانیو ئوممەتەکەی مەبەستە، ئەگەرنا بە تەئکید پێغەمبەر هیچ جۆرە دڵ لە دڵ دانو دوو دڵییەکی نەبووە، لەوبارەوە کە هەق لە پەروەردگاریەوەیەتی، ئنجا دەفەرموێ: ﴿ وَلِكُلٍّ وِجۡهَةٌ هُوَ مُوَلِّيهَا ﴾، واتە: بۆ هەرکامێك لە ئوممەتان ڕووگەیەك هەیە ڕووی تێدەکەن، واتە: هیچ ئوممەتێك نەبووە کە ڕووگەیەکی تایبەت بەخۆی نەبێ، قیبلەیەکی تایبەت بەخۆی نەبێ، تۆش ئەی موحەممەد ! خۆتو ئوممەتەکەت کەعبە ڕووگەی تایبەتی ئێوەیە، ئەوە مانایەکیەتی.

مانایەکی دیکەشی ئەوەیە کە هەرکەسە ئامانجێکی هەیە بەرەو ڕووی دەچێ، ئامانجی جوولەکەو نەصرانییەکان کە ئیمان بە تۆ ناهێنن بریتیە لە پاراستنی بەرژەوەندییەکانی خۆیان، ئامانجی تۆش بریتیە لە ڕازیکردنی خواو پابەندیی بە شەریعەتی خواوە، کەواتە ئەوان بە دوای ئامانجی خۆیان دەکەون، تۆش بەرەو ئامانجی خۆت لەرێ کردن دابە ﴿ فَٱسۡتَبِقُواْ ٱلۡخَيۡرَٰتِ ﴾، پێشبڕکە بکەن لە شتە چاکەکاندا، واتە: هەرچەندە هەرکامێکتان ڕووگەیەکی تایبەتی هەیە، بەڵام کۆمەڵێك شت هەیە خاڵی هاوبەشن لە نێوانیاندا، بەڵێ سەرجەم خاوەن کتێبە ئاسمانییەکانو خاوەن بەرنامە ئاسمانییەکان، مسوڵمانو جوولەکەو نەصرانییو هەموو ئەوانی دیکەش، کە خۆیان بە خاوەنی کتێبی ئاسمانیی دەزانن، کۆمەڵێك شتی چاك هەن کە هەمووتان بە خێرو چاکەیان دەزانن، دەجا پێشبڕکە بکەن

لە ئەنجامدانی ئەو چاکانەدا، کە خاڵی هاوبەشن لە نێوانتان، وەك بەندایەتیی کردن بۆ خوا، خۆ پاراستن لە قەدەغەکراوەکان، خۆ ڕازاندنەوە بە ڕەوشتی بەرزو جوان، وە کۆمەڵێك شتی دیکە کە لە هەموو کتێبە ئاسمانییەکاندا هەن ﴿ أَيْنَ مَا تَكُونُوا۟ يَأْتِ بِكُمُ ٱللَّهُ جَمِيعًا ﴾، لە هەر کوێیەك بن خوا هەمووتان وێکڕاو تێکڕا دێنێ‌و ڕۆژی دوایی کۆتان دەکاتەوە. ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴾، بێگومان خوا لەسەر هەموو شتێك بەتوانایە، کەواتە: خۆتان بۆ ئەو ڕۆژە ساز بکەن، کە خوا هەمووتان پێکەوە کۆدەکاتەوەو لێپرسینەوەتان لەگەڵدا دەکات.

ئنجا بۆ جاری دووەم فەرمان بە پێغەمبەر ﷺ دەکاتەوەو دەفەرموێ: ﴿ وَمِنْ حَيْثُ خَرَجْتَ فَوَلِّ وَجْهَكَ شَطْرَ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ ﴾، وە لە هەر کوێیەکەوە دەرچووی، واتە: لە هەر لایەکەوە لە مەککە دەرچووی، یان: بۆ هەر لایەك چووی، ڕووی خۆت بکە لای مزگەوتی حەرام ﴿ وَإِنَّهُۥ لَلْحَقُّ مِن رَّبِّكَ ﴾، وە بێگومان ئەو ڕووکردنی تۆ بەرەو مزگەوتی حەرام‌و بەرەو کەعبە، هەقەو لە پەروەردگارتەوەیە ﴿ وَمَا ٱللَّهُ بِغَٰفِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ ﴾، وە خوا بێئاگا نیە لەوەی کە ئەنجامی دەدەن، ئەوەی پێشێیان کە خوا ﷻ فەرمووی لە هەر کوێیەك بوون ﴿ وَحَيْثُ مَا كُنتُمْ فَوَلُّوا۟ وُجُوهَكُمْ شَطْرَهُۥ ﴾، ئەوە بۆ حاڵەتی نیشتەجێبوونە، بەڵام ئەمەیان: ﴿ وَمِنْ حَيْثُ خَرَجْتَ فَوَلِّ وَجْهَكَ شَطْرَ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ ﴾، لە هەر کوێیەکەوە دەرچووی، یان بۆ هەر شوێنێك چووی، هەر ڕوو لە کەعبە بکە، بۆ ئەوە بووە وانەزانن کە تەنیا کاتێك لە مەککەن دەبێ ڕوو لە کەعبە بکەن بۆ نوێژەکانیان، بەڵکو لە هەر شوێنێك بوون، ئەگەر لە سەفەریش بوون، دەبێ هەر ڕوو لە کەعبە بکەن، ئنجا بۆ جاری سێیەم دەفەرموێ: ﴿ وَمِنْ حَيْثُ خَرَجْتَ فَوَلِّ وَجْهَكَ شَطْرَ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ وَحَيْثُ مَا كُنتُمْ فَوَلُّوا۟ وُجُوهَكُمْ شَطْرَهُۥ ﴾، واتە: وە

لە هەر کوێیەکەوە دەرچووی ڕووی خۆت بکە لای مزگەوتی حەڕام، وە لە هەر شوێنێك بوون ڕووەکانی خۆتان بەرەو لای {مزگەوتی حەڕام} ڕاگرن، ئەوەش بۆ ئەوەی وا نەزانرێ کە ئەوە تایبەتە بە پێغەمبەرەوە ﷺ، بۆیە خوا ﷻ دووبارەی کردۆتەوە، ﴿ لِئَلَّا يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَيْكُمْ حُجَّةٌ ﴾، {بۆیە ڕووبکەنە کەعبە تاکو} خەڵك بەڵگەی لەسەرتان نەبێت، ﴿ إِلَّا الَّذِينَ ظَلَمُوا مِنْهُمْ ﴾، واتە: جگە لەوانەی ستەم دەکەن، یانی چی بەڵگەیان لەسەرتان نەبێ؟ هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان جۆرێك لە بڕوبیانوویان هەبوو، هەڵبەتە وشەی (حُجَّةٌ)، واتە: بەڵگە، بەڵام جاری واش هەیە بە مانای (بیانوو)ش بەکاردێت، یاخود بۆ شتێك کە خاوەنەکەی بە بەڵگەی دەزانێ، بەڵام بەڵگە نیە، وەك خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَالَّذِينَ يُحَاجُّونَ فِي اللَّهِ مِنْ بَعْدِ مَا اسْتُجِيبَ لَهُ حُجَّتُهُمْ دَاحِضَةٌ عِنْدَ رَبِّهِمْ وَعَلَيْهِمْ غَضَبٌ وَلَهُمْ عَذَابٌ شَدِيدٌ ﴿١٦﴾ ﴾الشورى، واتە: ئەوانەی کە شەڕە قسە دەکەن دەربارەی خوا، دوای ئەوەی کە وەڵامی دراوەتەوەو ئیمانی پێ هێنراوە، ئەوانە بەڵگە (حُجَّة) یان لەلای پەروەردگاریان پووچەڵە! واتە: ئەوەی کە ئەوان بە (حُجَّة) لێی حاڵی بوون، ئەگەرنا بەڵگە (حُجَّة)ی ڕاستەقینە پووچەڵ نیە، جا لێرەدا کە دەفەرموێ: ﴿ لِئَلَّا يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَيْكُمْ حُجَّةٌ ﴾، بۆ ئەوەی خەڵك بەڵگەیان لەسەرتان نەبێت، واتە: شتێك کە ئەوان خۆیان بە بەڵگەی دەزانن، بۆ وێنە: هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان دەیانگوت: باشە ئەگەر ڕاستە موحەممەد لەسەر ڕێبازی ئیبراهیمە، بۆ ڕوو لەو ماڵە ناکاتو ڕوو لەو قیبلەیە ناکات کە ئیبراهیم دروستی کردوە؟

جوولەکەکانیش دەیانگوت: لە کتێبی ئێمەدا هاتوە کە پێغەمبەری کۆتایی دوایین ڕووگەی یەکجارەکی کەعبە دەبێتو، بۆ خۆیان دەیانزانی ئەگەر ڕاست بکات پێغەمبەری کۆتایی بێ، دەبێ سەرەنجام هەر ڕوو بکاتەوە کەعبە، واتە: بۆ ئەوەی ئەوانە، نە هاوبەش بۆ خوا دانەرەکانو نە جوولەکەو نەصرانیی یەکان،

بەڵگەو بیانوویان نەمێنێ، ڕووبکەنە ئەوێ، ئنجا دەفەرموێ: ﴿ فَلَا تَخْشَوْهُمْ وَٱخْشَوْنِي ﴾، واتە: وە لێیان مەترسن‌و لە من بترسن‌و لەوان بێ باك بن ﴿ وَلِأُتِمَّ نِعْمَتِي عَلَيْكُمْ ﴾، وە بۆ ئەوەی نیعمەتی خۆم بەسەر ئێوەوە تەواو بكەم، كەواتە: ڕووكردنە كەعبەش، یەكێكە لە نیعمەتەكانی خوا، كە بە ئۆممەتی موحەممەدی ﷺ بەخشیوە ﴿ وَلَعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ ﴾، بۆ ئەوەی ڕێگەی ڕاست بگرن. كە ڕێگای ڕاست ئەوەیە ئینسان پابەندبێ بە شەریعەتی خواوە لە هەموو شتێكدا، ئنجا لە كۆتاییدا دەفەرموێ: ﴿ كَمَآ أَرْسَلْنَا فِيكُمْ رَسُولًا مِّنكُمْ يَتْلُواْ عَلَيْكُمْ ءَايَٰتِنَا ﴾، واتە: وەك چۆن لەنێو خۆتاندا پێغەمبەرێكم بۆ ناردن، ئایەتەكانی ئێمەتان بەسەردا دەخوێنێتەوە ﴿ وَيُزَكِّيكُمْ ﴾، وە تەزكیەتان دەكات. (يُزَكِّيكُم) واتە: پاكتان دەكاو چاكتان دەكات‌و گەشەتان پێ دەدا، چونكە وشەی (تَزْكِيَة) هەرسێ ماناكەی هەیە، هەم بە مانای پاكیی دێ، هەم بە مانای گەشەكردن دێ، هەم بە مانای چاكیی دێ ﴿ وَيُعَلِّمُكُمُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ وَيُعَلِّمُكُم مَّا لَمْ تَكُونُواْ تَعْلَمُونَ ﴾، وە كتێب‌و حیكمەتتان فێر دەكات، وە شتێكتان فێر دەكات كە نەدەگونجا بیزانن، واتە نەدەگونجا فێری ببن بەبێ وەحی، ﴿ فَٱذْكُرُونِيٓ أَذْكُرْكُمْ وَٱشْكُرُواْ لِي وَلَا تَكْفُرُونِ ﴾، واتە: دەجا یادم بكەن منیش یادتان دەكەم، وە سوپاسم بكەن‌و سپڵەییم بەرانبەر مەكەن، سوپاسكردنی خواش هەم بەدڵ دەبێ، هەم بە زمان دەبێ، هەم بە ئەندامەكانی دەبێت، بەدڵ نیعمەتەكە لە خوا بزانێ‌و، بە زمان دانی پێدابهێنێ، وە بە ئەندامەكانیشت ئەو نیعمەتانە لە ڕەزامەندیی خوادا بەكاربێنێ، سپڵەییش پێچەوانەی سوپاسگوزاریی‌و شوكرانەیە، خوا بە لوتف‌و كەرەمی ئێمە لە سوپاسگوزاران بگێڕێ، وە لەو كەسانەمان بگێڕێ، كە بە دڵ‌و بە زمان یادی خوا دەكەن.

## چەند مەسەلەیەکی گرنگ

**مەسەلەی یەکەم:** ئەوە کە خاوەن کتێبەکان بە تایبەت جوولەکەو نەصرانیی یەکان زانیویانە موحەممەد پێغەمبەری خوایە ﷺ، وەك پێشتریش باسمکرد، ئەگەر ئێستا ئەو مەسەلەیە جۆرێك لە تەمومژو لێلایی بەسەردوەبێ، بەلام کاتی خۆی کە کتێبەکانیان لەبەردەستیان بوون، تەوراتو ئینجیلو زەبوور، وە بەو شێوەیەی ئێستا دەستکاریی نەکرابوونو چاوەڕێیان کردوە کە موحەممەد ﷺ پێغەمبەری کۆتایی بێ، وە ئەوکاتە ئەو دەمارگیرییەی کە دوایی بۆیان پەیدابووە، نەیانبووەو، هەموو بەشەرییەت چاوەڕێی پێغەمبەری کۆتایی بووە. جا ئێستاش لەو تەوراتو ئینجیلو زەبوورانەی کە لەبەردەستدان، لەلای جوولەکەو نەصرانیی یەکان، ئێستاش بۆ زانایانی کە پسپۆڕو شارەزان چەند بڕگەیەك لەو کتێبانەدا هەن، کە بە ئاشکرا بەلگەن لەسەر ئەوەی کە موحەممەد ﷺ پێغەمبەری کۆتایی خوایە، بۆ وێنە: ئێستا لە پەیمانی کۆن (العهد القديم) لە (سِفْر التَّثْنِيَة) لە (إصحاح)ی (٣٣)دا، واتە: ئەوەی ئێستا کە هەیە، تەرجەمە عەرەبییەکەی ئەم دەقە هەیە، کە لەبەردەستی ئەهلی کیتاب دایە، دیارە پەیمانی کۆن کە (تەورات) بەشێکیەتی، هەرکام لە نەصرانیی یەکانو جوولەکەکانیش پێوەی پابەندنو بڕوایان پێیەتی[1]: ((وهَـذِهِ هِـيَ البَـرَكَة بـارَكَ بِـهَا مُوسَى رَجـلُ الله بَنـي إسـرائِيل قَبْـلَ مَوْتـهِ:

---

١) بڕوانە: (التفسير التطبيقي للكتاب المقدس) العهد القديم، سِفْرُ التثنية، الإصحاح: (٣٣)، ص: (٤١٥).

شایانی باسیشە کە بۆ وەرگرتنی ئەم دەقە گەڕامە بۆ دوو نوسخە لە (الكتاب المقدس) کە یەکیان ساڵی (٢٠٠٢) چاپ کراوەو یەکێکیشیان ساڵی چاپکرانی لەسەر نیەو، لەو دوو دێڕەدا ئەم جیاوازییانەیان لەنێواندا هەبوو:

١- أقبل الربّ / جاء الربّ. ٢- وأشرف عليهم / وأشرف لهم. ٣- وتألّق لهم / وتلألأ لهم (الكتاب المقدّس) ص: (٦١٥) ، ٤- في جبل فاران / من جبل فاران ٥- جاء محاطاً بعشرات / وأتى من رِبَوات القدس الألوف من الملائكة . (الكتاب المقدّس)، ص: (٣٣٤).

فَقَالَ: أقبل الرَّب مِنْ سِينَاءَ وأَشْرق علَيهُم مِنْ سَعيرو تألق في جَبَل فَارَان جاء مُحاطا بعشرات الألوف من الملائكة))، واته: {ئەمە ئەو بەرەکەتەیە کە مووسا پیاوی خوا، بەنی ئیسرائیلی پێ بەرەکەتدار کرد، لەپێش مردنیدا گوتی: پەروەردگار لە (سینا)وە هات (واتە: وەحی یان پێغەمبەری پەروەردگار لە سیناوە هات) وە لە چیای (سعیر) بۆیان هەڵهات، وە لە چیای فاران درەوشایەوە، هات دەیان هەزار فریشتە دەوریان دابوو}. ئەم سێ شوێنە: (سینا) ئەو شوێنەیە کە کێوی طووری لێیەو مووسا لەسەر کێوی طووڕ تەوراتی لە خوا وەرگرت، (سعیر)یش ناوی ئەو چیایەیە کە لە مەنتیقەی (ناصرة)یەو عیسا لەوێ هات، (فاران)یش بەزمانی عیبریی یانی (مەککە) واتە: چیاکانی مەککە کە پێغەمبەری کۆتایش لەوێ هات، بەڵگە لەسەر ئەوەی کە فاران بە مانای مەککەیە .. هەر لە عەهدی قەدیم لە (سفر)ی (تكوين) لە (إصحاح)ی (٢١)دا ئاوا هاتوە: ((وكَانَ الله مَعَ الصَّبيِّ فَكَبُرَ وسكن في صحراء فاران، و بَرَجَ في رمي القدس))[1] باسی ئیبراهیم و ئیسماعیل دەکات هەر ناوەکەشیان دێنێ و دەڵێ: (وە خوا لەگەڵ ئەو کوڕە بوو (واتە: لەگەڵ ئیسماعیل بوو) تا گەورە بوو (سەرپەرشتی کرد) وە لە بیابانی فاراندا نیشتەجێ بوو، بابایەکی تیر هاوێژی کارامە بوو، (واتە: ڕاوچیی بوو دیارە هەرواش بووەو ئیسماعیل ڕاوچیی بووەو لە دەشتی فاران نیشتەجێ بووە، (فاران)یش (إبن الأثير) دەڵێ: بەزمانی عیبریی ناوی چیاکانی مەککەیە، وە هەر لەوێدا باسی ئیبراهیم دەکات کە چۆن ئیسماعیل و هاجەرەی بردوە لە مەککە نیشتەجێی کردوون[2]. کەواتە: مووسا عليه السلام هەم باسی خۆی کردوەو، هەم باسی عیسای کردوە کە لە چیاکانی (سعیر)ەوە دێ، وە هەم باسی

---

١) بڕوانە: سەرچاوەی پێشوو، ص (٥٦).

شایانی باسە لێرەشدا دوو نوسخەکەی (الكتاب المقدس)م بەراورد کردن، دیسان لەیەك جیاواز بوون! بەڵام ئایا نوسخەو چاپەکانی (مصحف)ی مسوڵمانان پیتێکیان لەگەڵ یەکدیدا جیاوازن نەك وشەو ڕستە !؟.

٢) سەرچاوەی پێشوو، ص (٥٦)، (طَرْدُ هاجر و إسماعيل).

پێغەمبەری كۆتایشی كردوە كە لە چیاكانی مەككە، وەحی خوا بۆ دوایین جار لەوێوە دەدرەوشێتەوەو بریقەدەدا.

**مەسەلەی دووەم:** كە خوا ﷻ بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ﴿ فَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلۡمُمۡتَرِينَ ﴾، دەجا لە دوودڵان مەبە، بێگومان هەم لێرەو هەم لە چەند شوێنی دیكەدا، كە بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: لە گوماندا مەبە، دڵ لە دڵ مەدە، بۆ وێنە: ﴿ فَإِن كُنتَ فِي شَكٍّ مِّمَّآ أَنزَلۡنَآ إِلَيۡكَ فَسۡـَٔلِ ٱلَّذِينَ يَقۡرَءُونَ ٱلۡكِتَٰبَ مِن قَبۡلِكَۚ ﴿٩٥﴾ ﴾ يونس، واتە: ئەگەر لە گوماندای لەو كتێبەدا كە بۆمان ناردووی، لەوانە بپرسە كە لە پێش تۆدا كتێبیان دەخوێندەوە، (واتە: لەو زانایانەی ئەهلی كیتاب بپرسە ئەوانەی كە ئیمانیان هێناوەو ناوو سیفەتەكانی تۆیان لەلایە).

لە سوننەتدا هاتوە كە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: {(لا أَشُكُّ ولا أَسْأَلُ) (أَخْرَجَهُ عَبْدُالرَّزَاق في (المصنف) برقم: (١٠٢١١)، عَنْ قتادة، وقال الطَّبَرِي في (التفسير): حَدِيث مُرسَل}، واتە: نە گومانم هەیەو نە پرسیاریش دەكەم، لێرەدا دەبێ بزانین كە مەبەست لەم دواندنەی خوای پەروەردگار كێیە؟ لەڕاستیدا مەبەست ئەوانەن كە لە پشت پێغەمبەرەوەن ﷺ، وەك كوردەواریی خۆماندا دەڵێ: (دیوار لەگەڵ تۆمەو گوێ سوانە گوێت لێبێ)، هەندێ دواندن (خطاب) هەیە كە خوا ﷻ لەگەڵ پێغەمبەردا دەیكاتو مەبەستی پێ ئۆممەتەكەیو شوێنكەوتووانیەتی، واتە: ئەی مسوڵمانینە! ئەگەر لە گوماندان فەرموون دیراسەی كتێبە پێشووەكان بكەن، لەوانیشدا باسی پێغەمبەری كۆتایی كراوە، مەبەستم ئەوەیە بەهەڵە لەو تەعبیرانە تێنەگەینو پێمان وابێ یان خەتەرەیەكمان بەدڵ دابێ: تۆ بڵێی پێغەمبەر ﷺ جۆرێك لە گومانی هەبووبێو دوودڵیی بووبێ! نەء، بەڵكو مەبەست پێی ئۆممەتەكەیەتی، بەڵام دواندن (خطاب)ە كە لەگەڵ ئەوە، ئنجا دیارە كە لەسەر مەسەلەی گۆڕینی قیبلە، هەم جوولەكەكان هەم نەصرانیی یەكان، هەم بتپەرستەكان، جەنگێكی

ڕاگەیاندنی گەورەیان بەرپاکردوەو بانگەشەی خراپیان زۆر کردوە بۆیە خوا ﷻ بەپێویستی زانیوە ئەم چەند ئایەتانەی بۆ تەرخان بکات، وە ئەوەندە بە جەخت لەسەرکردنەوە، بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: بە مسوڵمانان بڵێ ڕوو لە کەعبە بکەن، وا دیارە زەختو فشارێکی زۆریان لەسەر بووەو پڕوپاگەندەی زۆریان لەدژ کراوە.

**مەسەلەی سێیەم:** خوای بەرزو مەزن سێ جاران فەرمانی بە ڕووکردنە کەعبە کردوە، کە بێگومان هەر کام لەو سێ جارانە حیکمەتو هۆکارێکی تایبەتی خۆی هەیە:

جاری یەکەمیان: کە دەفەرموێ ڕووی تێبکەن، ئەوە تەنیا بۆ ڕوو تێکردنی ئەوانەیە کە لە مەککەو دەوروبەرینی.

جاری دووەمیان: باسی ئەوە دەکات کە کاتێك لە ماڵ دەرچوونو بە سەفەر چوون، ڕووی تێ بکەن، بۆ ئەوەی وا نەزانن کە ئەوە تەنیا کاتێك کە لە مەککەو دەوروبەریو لە ماڵی خۆیانن، دەبێ ڕوو لە کەعبە بکەن، بەڵکو دەبێ کە دەریشچوون لە ماڵ هەر ڕووی تێ بکەن.

جاری سێیەمیان: بەبۆنەی بەرپەرچدانەوەی پڕوپاگەندەی ناحەزو نەیارەکانیانەوەیە، هەم جوولەکەو نەصرانییەکانو هەم هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان، کە خوا ﷻ فەرمان بە پێغەمبەرو مسوڵمانان دەکاتو جەختیان لەسەر دەکاتەوە، کە هەر ڕووبکەنە کەعبەو گوێ بە قسەو قاڵی ناحەزانیان نەدەن.

**مەسەلەی چوارەم:** کە دەفەرموێ: ﴿لِئَلَّا يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَيْكُمْ حُجَّةٌ﴾، بۆ ئەوەی خەڵك بەڵگەی لەسەرتان نەبێ، وەك لە مانا گشتییەکەشدا باسمکرد، جوولەکەکان دەیانگوت: ئەگەر پێغەمبەری کۆتایی یە، پێغەمبەری کۆتایی لە کتێبەکانی ئێمەدا باسکراوە کە دەبێ ڕوو لە دوو قیبلان بکات، ئەدی ئێستا موحەممەد بۆ هەر ڕوو لە (بيت المقدس) دەکات، کوا قیبلەی دووەمی؟! بۆ ئەوەی ئەو بەڵگەو بیانوویان بە دەستەوە نەمێنێ، ئەوە بەنسبەت

ئەوانەوە، هاوبەش بۆ خوا دانەرەکانیش دەیانگوت: ئەگەر موحەممەد لەسەر ڕێبازو ئاینی ئیبراهیمە، بۆچی ڕوو لە قیبلەکەی ناکات؟ ئەوە مانای وایە هەردووکیان دەمکوت بوون بەوە، بۆیە خوا دەفەرموێ: تاکو بەڵگە (حُجَّة)یان لەسەرتان نەمێنێ، ڕوو لە کەعبە بکەن.

**مەسەلەی پێنجەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ إِلَّا ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ مِنْهُمْ ﴾، بێجگە لەوانەی ستەم دەکەن، لەوان، واتە: ئەوان هەر دەمکوت ناکرێن، بۆچی؟ چونکە بۆ وێنە: جوولەکەکان لە پێشوودا دەیانگوت: کوا دوو قیبلەکانی؟ دوایی کە خوا ﷻ فەرمووی: ڕووبکەنە قیبلەی دووەمیش، ئەوە مانای وایە ئەو قسەیان هاتەدی، کەچی ئەو جار دەیانگوت: موحەممەد گەڕایەوە سەر دینەکەی خۆی، گەڕایەوە سەر بتپەرستیی، ئەمڕۆ گەڕاوەتەوە سەر قیبلەکەیان، سبەی دەگەڕێتەوە سەر شتێکی دیکەش !! واتە: پێشێ جوولەکەکان شتێکیان دەگوت کە هەق بوو، دوایی شتێکیان دەگوت کە ناهەق بوو، بۆیە خوا ئەوەی بە زوڵم داناوە هی پێشێی بە بەڵگە (حُجَّة) داناوە، بەلام ئەوەی دوایەی بە زوڵم داناوە، بتپەرستو هاوبەش بۆ خوا دانەرەکانیش قسەکەی پێشێیان تاڕادیەك وا بوو، بەلام دوایی دەیانگوت: هاتەوە سەر ئایینو ڕێبازی ئێمە، پێشێ دەیانگوت: ئەوە موحەممەد شوێن جوولەکەکان دەکەوێت، ڕوو لە قیبلەی ئەوان دەکات، دوایی دەیانگووت: هاتەوە سەر ڕێبازو ئایینی ئێمە، خۆ تۆ نابێ ئەو هەقەی کە لەسەری وازی لێبێنی لەبەر ئەوەی خەلکێك بەڵگەو بیانووی ناهەق هەڵدەتاشێ، زۆرجار وادەبێ کە ئینسان شتێکی هەقو چاك دەڵێ، ناحەزێکی لەو شتە هەقو چاکە، بەڵگەیەك بۆ خۆی دەتاشێ، تۆ نابێ دەستبەرداری ئەو هەقەبی، یان تۆ فیکرەیەك پێشنیار (طَرْح) دەکەی، ئەو فیکرەیەی تۆ لەگەڵ فیکرەی یەکێکی دیکە کە ئەهلی باتیڵە تێکدەکاتەوە، تۆ لەبەر ئەوەی لەگەڵ هی وی تێکدەکاتەوە نابێ وازی لێبێنی، وەك پێغەمبەر ﷺ کاتێك هاتە مەدینە جوولەکەکان لە عاشوورا {(١٠)ی موحەڕڕەم} بەڕۆژوو دەبوون، جا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بۆ بەڕۆژوو دەبن؟

گوتیان: لەم ڕۆژەدا خوا مووسای ڕزگار کردوە لە دەستی فیرعەون، ئەویش فەرمووی: {(نَحْنُ أَحَقُّ وَأَوْلَى بِمُوسَى مِنْكُم) (أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٢٦٤٤)، وَالبُخَارِيُّ برقم: (٣٩٤٣)، وَمُسْلِمٌ برقم: (١١٣٠)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٢٤٤٤)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (١٧٣٤)، عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنه}، واتە: ئێمە بە مووسا شایستەترو لە پێشترین لە ئێوە (جوولەکەکان)، مرۆڤ دەبێ شوێن هەق بکەوێ، با ئەو هەقە جارجار لەگەڵ ئەوەی کە ئەهلی باتیڵیش لەسەرن، تێکبکاتەوە.

**مەسەلەی شەشەم:** ئەوە کە دەفەرموێ: ﴿ فَلَا تَخْشَوْهُمْ وَٱخْشَوْنِي ﴾، لەوان مەترسن‌و لە من بترسن، ئەوەی لێ وەردەگیرێ کە بەڕاستی ئینسان کاتێ دەتوانی پابەندبێ بەشەریعەت‌و بەرنامەی خواوە، کە لە خەڵك بێباك بێ: لە توانج و پلاری خەڵك لە پڕوپاگەندەیان لە قسەو قسەلۆکیان، ئەگەرنا هەتاکو مرۆڤ دەربەستی قسەی خەڵك بێ، داخۆ چی دەڵێن؟! هیی بۆ ناکرێ، وە بەڵێ ئەگەر بتەوێ خەڵك لە خۆت ڕازیبکەی خوات پێ ڕازی ناکرێ‌و کاتێك دەتوانی بەڕاستی پابەندبی بەشەریعەتی خواوە، کە تەنیا ترسی خواو سامی خواو هەیبەتی خوا لەدڵتدا هەبێ‌و لە خەڵکی دیکە بێباك بی.

**مەسەلەی حەوتەم:** خوا ﷻ وەك لە دەرسێکی دیکەشدا باسمان کرد، ئەرکی پێغەمبەر ﷺ لە چوار شوێن لە قورئانێدا لە چوار شتاندا کورت دەکاتەوە: ﴿ يَتْلُواْ عَلَيْكُمْ ءَايَٰتِنَا وَيُزَكِّيكُمْ وَيُعَلِّمُكُمُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ ﴾، لە شوێنێکی پێشتر هەر لە سوورەتی (البقرة)دا، هاتوە کە ئیبراهیم لەگەڵ ئیسماعیلی کوڕی سەلامی خوایان لێبێ دووعایان کرد بۆ وەچەکەیان کە خوا پێغەمبەرێکیان لەنێودا بنێرێ‌و فەرموویان: ﴿ رَبَّنَا وَٱبْعَثْ فِيهِمْ رَسُولًا مِّنْهُمْ يَتْلُواْ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتِكَ وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ وَيُزَكِّيهِمْ ۚ إِنَّكَ أَنتَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿١٢٩﴾ ﴾، وە لە سوورەتی (آل عمران)یشدا هاتوە، وە لە سوورەتی (جُمُعَة)شدا هەمان مەبەست هاتوە، جا کاتی خۆی لە دەرسێکی دیکەدا هەندێ شتمان لەوبارەوە باسکردو ئێستاش دەڵێین: ئەوە زۆر جێی سەرنجە کە خوا ﷻ

ئەرکی پێغەمبەر، کە دەبێ لەگەڵ ئۆممەتەکەیدا ئەنجامی بدات، لەو چوار شتەدا کۆدەکاتەوە:

یەکەم: ﴿ يَتْلُواْ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتِكَ ﴾، یەکەمین شتێك کە لە هەر چوار شوێنەکانیش لە ڕیزبەندیدا خراوەتە یەکەمەوە، بریتیە لە چی؟ خوێندنەوەی ئایەتەکان ئایەتی قورئانە، ئەمە چی لێ وەردەگیرێ؟ ئەوەی لێ وەردەگیرێ کە بناغەو بنەڕەتی دینداریی‌و مسوڵمانەتیی، چ عەقیدە، چ عیبادەت، چ تەزکیەی نەفس، چ حوکم‌و سیاسەت، چ جەنگ‌و جیهاد، چ موعامەلەو هەڵسوکەوت ... بناغەی مسوڵمانەتیی بە هەموو لایەنەکانییەوە، لە چی ڕا دەست پێ دەکات؟ لە خوێندنی قورئان‌و بەسەردا خوێندنەوەی قورئان، کەواتە: دەبێ وریابین، هەرکاتێك دینداریی ئێمەو مسوڵمانەتیی ئێمە لەسەر بناغەی قورئان نەبوو، لەسەر بناغەی خوێندنەوەی ئایەتەکان‌و تێگەیشتنی ئایەتەکانی خوا نەبوو، دەبێ بزانین بەڕاستی دینداریی‌یەکەمان بەرەو لادان (إنحراف)ەو بەرەو هەڵە دەچین، بۆچی؟ چونکە هەر ئەسڵی دینداریی‌یەکەو مسوڵمانەتییەکە بۆخۆی بریتیە لە قورئان‌و، دەبێ لەوێوە دەست پێبکرێ، ئنجا ئەگەر تەماشاش بکەین بۆچی جیلی هاوەڵان خوا لێیان ڕازی بێ لە هەموو کەس زیاتر سەرکەوتوو بوون کە دینداریی‌یەکی چاك بکەن؟ چونکە بە ڕاستی لە هەموو جیلەکان زیاتر پابەند بوون بە قورئانەوە، وە لە دوای ئەوانیش لە هەر شوێنێك دین بووژابێتەوەو مسوڵمانەتیی گەشەی کردبێتەوە، هەر لەسەر دەستی کەسانێك بووە کە لە قورئانێ ڕا دەستیان پێ کردۆتەوە، لە خوێندنی قورئان‌و تێگەیشتنی قورئان‌و پابەندیی بە قورئانەوە.

دووەم: ﴿ وَيُزَكِّيكُمْ ﴾، پاشان دەبێ بزانین کە لە دوای خوێندنەوەی قورئان‌و تێگەیشتنی قورئان، چی پەیدا دەبێت؟ (تَزْكِيَة)، لەو چوار شوێنە، لە سێ شوێنەدا لەدوای خوێندنەوەی ئایەتەکان، دەفەرموێ: ﴿ وَيُزَكِّيكُمْ ﴾، بۆچی؟ هەر کەسێك قورئانی خوێندو تێیگەیشت‌و لێی حاڵی بووو تەفاعولی لەگەڵ کرد، مسۆگەر ئەو قورئانە پاکی دەکاتەوە لە ژەنگ‌و ژارو خڵتەوخاڵ،

لە رووی فیکریی‌و عەقیدەیی‌و ئەخلاقیی‌و عیبادیی‌و هەڵسوکەوتی کۆمەڵایەتیی‌و هەڵسوکەوتی خێزانیی‌و لە رووی سیاسی‌و لە هەموو رووێکەوە، پاکی دەکاتەوەو دەیرازێنێتەوە، پاکی دەکات‌و پاشان چاکی دەکات‌و دەیرازێنێتەوە، واتە: شەخصیەتی کامڵ دەکات‌و گەشەی پێ‌دەدا، چونکە تەزکیە هەر سێ مانایەکەی هەیە، مانای پاکیی (طَهارْة)و، چاکیی (صَلاَح)و گەشەکردن (نُمُّو) دەگەیەنێ، بەڵێ لەڕاستیدا ڕاستەوخۆ پاش تەفاعولکردن لەگەڵ قورئان‌و خوێندنەوەی ئایەتەکان‌و تێگەیشتنیان، ئینسان حاڵەتی تەزکیەی بۆ دێتە دی.

سێیەم‌و چوارەم: ﴿وَيُعَلِّمُكُمُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ﴾، کتێب‌و حیکمەتتان فێردەکات.

قۆناغی یەکەم: بۆ دینداریی‌کردن، بریتیە لە تێگەیشتنی قورئان‌و خوێندنەوەی ئایەتەکانی قورئان.

قۆناغی دووەم: بریتیە لەوە کە تەفاعول لەگەڵ قورئاندا بکەی‌و، ئەو قورئانە کارت تێبکات بتگۆڕێ چاك‌و پاکت کات‌و گەشەت پێبکات، ئەم دوو قۆناغە زیاتر پەیوەندییان بە تاکەوە هەیە.

قۆناغی سێیەم‌و چوارەم: ئەوەیە، کە ئەو تاکانە کە قورئانیان وەرگرت‌و پێوەی پابەندبوون، ئەوجار ژیانی کۆمەڵایەتیی‌و سیاسیی خۆیانیانی پێ ڕێکبخەن، بۆیە دەفەرموێ: ﴿وَيُعَلِّمُكُمُ ٱلْكِتَٰبَ﴾، (کتاب) لێرەدا بە مانای قورئان نیە بەڵکو بەمانای بەرنامەو شەریعەتە، وەك پێشتریش باسمانکردو روونمان کردەوەو لێرە دوبارەی ناکەینەوە، واتە: پێغەمبەر ﷺ شەریعەت‌و یاساکانی کە لە قورئاندا هاتوون، بۆ ئەوەی ژیانی تاکی‌و خێزانیی‌و کۆمەڵایەتییان ڕێکبخات، ئەوانەیان فێردەکات، وە بە کردەوەش هەروابووو پێغەمبەر ﷺ لە مەککەدا ئایەتەکانی بەسەردا خوێندنەوەو تەزکیە بوون، بەڵام ئایا لە کوێ بەرنامەو یاساکان لە قورئان هەڵهێنجراون‌و ژیانیانی پێ ڕێکخراوە؟ بێگومان لە مەدینەدا.

ئەدی حیکمەت چییە؟ هەندێ لە توێژەرەوانی قورئان دەڵێن، حیکمەت واتە: سوننەتی پێغەمبەر ﷺ، بەڵام لەڕاستیدا ناگونجێ حیکمەت بە سوننەت تەفسیر بکرێ، بۆچی؟ چونکە:

یەکەم/ خوا ﷻ دەربارەی لوقمان خوا لێی ڕازی بێ، دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا لُقْمَٰنَ ٱلْحِكْمَةَ ...﴿١٢﴾﴾لقمان، واتە: ئێمە حیکمەتمان بە لوقمان بەخشیبوو، ئنجا دیارە لوقمان سوننەتی پێغەمبەری ﷺ نەدراوەتێ، وە لوقمان هەر پێغەمبەریش نەبووە، تا بڵێی پێغەمبەرێکی خاوەن سوننەت بووە.

دووەم/ پاشان خوا ﷻ باس دەکات، کە حیکمەت شتێکە بە غەیری پێغەمبەرانیش (علیهم الصلاة والسلام) دەبەخشرێ، وەك لە سوورەتی (البقرة)دا دەفەرموێ: ﴿يُؤْتِى ٱلْحِكْمَةَ مَن يَشَآءُ ۚ وَمَن يُؤْتَ ٱلْحِكْمَةَ فَقَدْ أُوتِىَ خَيْرًا كَثِيرًا ۗ وَمَا يَذَّكَّرُ إِلَّآ أُو۟لُوا۟ ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿٢٦٩﴾﴾، واتە: (خوا) حیکمەت بەهەر کەسێك دەدا کە بیەوێ، وە هەرکەسێ حیکمەتی پێ درابێ، چاکەیەکی گەورەی پێدراوە، وە خاوەن عەقڵان نەبێ بیرناکەنەوەو پەند وەرناگرن، واتە: هەموو خاوەن عەقڵان کەم‌و زۆر حیکمەتیان پێ دەبەخشرێ، کەواتە: ئایا حیکمەت چییە؟ زانایان پێناسەی حیکمەتیان بەم شێوەیە کردوە:

(الإِصَابَةُ فِي القَوْلِ والفِعْلِ)، واتە: بریتیە لە لە نیشانەدان لە قسەو لە کرداردا، یانی: قسەی بەجێ‌و کرداری بەجێ، ئێمەش دەتوانین بڵێین حیکمەت، واتە: کارپێکردنی شەریعەتێك، کە لە قورئان هەڵدەهێنجرێ بە وەستایی‌و بە دانایی، هەر شتە لە شوێنی خۆی‌و هەر ئایەتەو هەر یاسایە لە شوێنی خۆیداو، لە قۆناغی خۆی‌و لە هەلومەرجی خۆیدا جێبەجێ بکەی، کە ئەوە بە تەئکید پێویستی بەوە هەیە کە تۆ هەم قسەت بەجێ‌و هەم کردارت بەجێ بێت، بەڵێ کە هەرشتە لە شوێنی خۆیدا دابنێی، ئەوە کارامەیی‌و وەستایی‌و لێزانیی دەوێ.

**مەسەلەی هەشتەم:** کە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ فَٱذۡكُرُونِيٓ أَذۡكُرۡكُمۡ ﴾، یادم بکەن یادتان دەکەم، ئەوەش بەڕاستی موژدەیەکی زۆر خۆشی تێدایە، کە بە حەقیقەت ئێمە بە وشان ناتوانین تەعبیر لەو حەقیقەتە گەورەیە بکەین، کە خوا یادی ئێمە دەکاتو باسمان دەفەرموێ! چونکە (ذکر) بریتیە لەوە کە شتێك لە دڵتدا ئامادەبکەی یان بە زمانت باسی بکەی، جا دیارە ئێمە نازانین خوا ﷻ چۆن چۆنی باسی ئێمە دەکات؟ چونکە خوا ئێمەی هەمیشە لەیادەو دەمانبینێ، بەڵام دیارە خوا ﷻ بە شێوە باسکردنێك باسمان دەکات، کە هەر بۆ خۆی دەزانێ چۆنە؟! وەك لەم فەرموودە قودسییەدا هاتووە: {(يَقُولُ الله تَعالى: أَنَا عِنْدَ ظَنِّ عَبْدِي بِي، وأَنَا مَعَهُ إذَا ذَكَرَني، فإنْ ذَكَرَني في نَفسِهِ ذَكَرتُهُ في نَفْسِي، وَإنْ ذَكَرَني في مَلأ ذَكَرتُهُ في مَلأ خَيْرٍ مِنْهُمْ، وإنْ تَقَرَّبَ إليَّ بِشِبْرٍ تَقَرَّبْتُ إلَيهِ ذِراعاً، وإنْ تَقَرَّبَ إليَّ ذِرَاعاً تَقَرَّبْتُ إلَيهِ بَاعاً، وإنْ أتَاني يَمْشِي أتَيتُهُ هَرْوَلَةً) (رَوَاهُ البُخَارِيُّ بِرقم: (٧٠٦٦)، وَمُسْلِمٌ بِرقم: (٢٦٧٥)، وَالتِّرمِذِيُّ بِرقم: (٣٦٠٣)، وَابْنُ مَاجَهْ بِرقم: (٣٨٢٢)، وَابْنُ حِبَّانَ بِرقم: (٨١١)، عَنْ أَبي هُرَيرَةَ رضي الله عنه }، واتە: پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: خوای بەرز دەفەرموێ: من لەگەڵ بەندەی خۆم دام کاتێك یادم دەکاتو باسم دەکات، ئەگەر لە دەروونی خۆیدا یادم بکاتو باسم بکات، منیش لە دەروونی خۆمدا باسی دەکەم {بە پەنهانیی}، بەڵام ئەگەر لەنێو کۆڕێکدا باسم بکات، من لە کۆڕێکی باشتردا لە کۆڕەکەی ئەو باسی دەکەم {کە کۆڕی فریشتە نزیکەکانە}، وە ئەگەر بستێك لێم نزیك بێتەوە من باسکێك لێی نزیك دەبمەوەو، ئەگەر باسکێك لێم نیزیك بێتەوە، من باڵێك لێی نزیك دەبمەوە، وە ئەگەر بە ڕۆیشتن بەرەو لای من بێ، من بە ڕاکردن بەرەو ڕووی دەچم.

هەڵبەتە ئەوە لێرەدا هەمووی وێناکردن (تَمْثِيل)ە، ئەگەرنا خوای بێ وێنە ڕاکردنو وێنەی ئەوانەی نیە، یان وەك لە فەرموودەیەکی دیکەی قودسیدا

هاتوە كە (بخاري) گێڕاویەتیەوە، دەفەرمویٚ[1]: بەندەی من بە هیچ شتێك ئەوەندە لە من نزیك نەكەوتۆتەوە، وەك جێبەجێكردنی فەرزەكان، وە بەردەوام بە كردنی سوننەتەكان لێم نزیك دەبێتەوە تاكو خۆشمدەویٚ، جا ئەگەر خۆشمویست دەبمە ئەو بیستنەی پێی دەبیستیٚو، ئەو دیتنەی پێی دەبینیٚو، ئەو دەستەی شتی پیٚ دەگریٚو، ئەو لاقەی پێی دەڕوا، دیارە خوا ﷻ نابێتە چاوو دەستو گویٚو لاق ! كەواتە: ئەمە یانی چی؟ یانی: وای لیٚ دەكەم چاوی تەنیا لە ڕەزامەندیی من حەرەكە بكاتو، گوێی هەر بۆ ئەو شتانە ڕادێریٚ كە من پێم خۆشەو، دەستی تەنیا بۆ ئەو شوێنانە بەكاربێنیٚ كە من پێم خۆشە، هەروەها بەپێی تەنیا بۆ ئەو شوێنانە بڕوا كە من پێم خۆشە، واتە ئەندامەكانی لە ڕەزامەندیی مندا نەبیٚ جمو‌جۆڵ نەكەن، مەبەست پێی ئەوەیە، جا وەك گوتم بەڕاستی ئەوە موژدەیەكی خۆشە، كە بەهۆی یادكردنت بۆ خواوە، خوا یادت بكات ! بۆیە یەكیٚ لە هاوەڵان بە پێغەمبەر ﷺ، دەفەرمویٚ: ئەی پێغەمبەری خوا شتێكم پیٚ بڵیٚ كەم بیٚو جێبەجێی بكەم، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: {(لاَيَزَالُ لِسَانُكَ رَطْبًا مِنْ ذِكْرِ اللَّهِ) (أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (١٧٧١٦) وَالتِّرمِذِيّ برقم: (٣٣٧٥) وَقَالَ: حَسَنٌ غَرِيبٌ، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٣٧٩٣)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٨١٤)، وَالحَاكِمُ برقم: (١٨٢٢)، وَقَالَ: صَحيح الإسناد، والطَّبَرَانِي في (الأوسط) برقم: (٢٢٦٨)، عَنْ عَبْدِاللَّهِ بْنَ بُسر رضي الله عنه، وَصَحَّحَهُ الأَلباني}، واتە: با هەمیشە زمانت تەڕو پاراو بێت بەیادی خوا، واتە: ئەوە سەری هەموو شتێكە، وە بە حەقیقەت ئینسان ئەگەر بێتو هەمیشە زیكرو یادی خوا بكات، هەرچەندە هەموو جاریٚ دڵیشی لەگەڵ زیكرو یادی خوا نەبیٚ، بەرەكەتی هەر هەیە، ئاشكراشە

[1]) كە ئەمە دەقەكەیەتی: { عن أبي هريرة أن رسول الله ﷺ قال: (إن الله تعالى قال: مَن عادى لي وليا فقد آذنته بالحَرب، وما تَقَرَّبَ اليَّ عبدي بشيءٍ أحَبَّ اليَّ ممّا افترضت عليه، وما يزالُ يَتَقَرَّبُ اليَّ بالنَّوافل حتى أحِبَّهُ، فإذا أحْبَبْتُهُ، كنت سَمْعَهُ الذي يَسْمَعُ بهِ، وبَصَرَهُ الذي يبصِرُ بهِ، ويَدَهُ الَّتي يَبْطِشُ بها، و رِجْلَهُ التي يَبطِشُ بها، و رِجْلَهُ التي يمشي بها، و إن سألني لأعطيَنَّهُ وَلَئن استعاذني لأعيذَنَّهُ) رواه البخاري، برقم (٦٥٠٢).

زیکرو یادی خوا تەنیا بریتیە نیە لە دووبارەکردنەوەی هەندێ وێردی وەك: ((لاَ إلـهَ إلاَّ الله، الحَمـدُ الله، سُبحَانَ الله، الله أكبَر، أستغـفِرُ الله))، یان صەڵەوات دان لەسەر پێغەمبەر ﷺ، مەرج نیە هەر ئەوەبێ، بەڵكو هەر شتێك پەیوەندی بە خواوە هەبێو پەیوەندی بە دینی خواوە هەبێ، هەر بە زیكری خوا حیسابە، بۆ وێنە: ئێستا ئێمە كە قورئان دەتوێژینەوە، سەرگەرمی یادی خواین، بۆیە زانایان گوتوویانە: هەرچی پەیوەندی بە خواوە هەبێ باسی بكەی، ئەوە پێی دەگوترێ: زیكرو یادی خوا ﷻ.

**مەسەلەی نۆیەم:** كە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَٱشْكُرُواْ لِى وَلَا تَكْفُرُونِ ﴾، سوپاسگوزاربن بۆ من وە سپڵە مەبن، لە پێشوودا باسمان كرد (شكر) بە سێ شتان دەكرێ: بە دڵ، بە زمان، بە ئەندامەكان، وە (شكر) جیایە لە (حَمْد)، (حَمْد) ستایشكردنی خوایە (حَمْد وثنا)ی خوا، بەدڵو بە زمان دەكرێ، بەڵام (شكر) بە زمانو دڵو ئەندامەكان دەكرێ، ئنجا سوپاسگوزاریی (شكر) لە بەرانبەر (نعمة) دایە، بەڵام (حَمْد) ستایشی خوا (حمد الله) مەرج نیە لە بەرانبەر نیعمەتەكانی خوا دابێ، بەڵكو لە بەرانبەری سیفەتە بەرزو بێ وێنەكانی خوا دایە ﷻ، واتە: مەرج نیە ئێمە لەبەر ئەوە ستایش (حَمْد)ی خوا بكەین كە چاكەی لەگەڵ كردووین، بەڵام بۆیە سوپاس (شكر)ی دەكەین، چونكە نیعمەتەكانی پێداوین، وە سوپاسگوزاریی (شكر) بۆ خوا بەمجۆرە دەكرێ:

یەكەم: ئەو نیعمەتو چاكانەی خوا بەهی خوا بزانین، وەك دەفەرموێ: ﴿ وَمَا بِكُم مِّن نِّعْمَةٍ فَمِنَ ٱللَّهِ... ﴿٥٣﴾ ﴾ النحل، واتە: هەرچی چاكەو نیعمەتە لە ئێوەدا، هەمووی لە خواوەیە، بەشی یەكەمو بناغەی (شكر) ئەوەیە كە هەموو نیعمەتەكان ببەیەوە بۆ لای خوا، وە لە ڕاستیشدا هەر لە خواوەنو خوا بۆخۆی دەفەرموێ: هەرچی چاكەیەو نیعمەتو خۆشی یە لە ئێوەدا لە خواوەیە.

دووەم: ئەوەیە كە بە زمان باسی نیعمەتو چاكەكانی خوا بكەی، وەك دەفەرموێ: ﴿ وَأَمَّا بِنِعْمَةِ رَبِّكَ فَحَدِّثْ ﴿١١﴾ ﴾ الضحى، واتە: وە باسی چاكەی

پەروەردگارت بکە، بەڵێ نیعمەتەکانی خوا باس بکەی‌و ستایشی بکەی‌و بڵێی: سوپاس بۆ تۆ خوایە ستایش بۆ تۆ، لێت مەمنونم.

سێیەم: (شکر) بەوە ئەنجام دەدرێت کە بە کردەوە ئەو نیعمەتانەی خوا لە ڕەزامەندیی خوادا بەکاربهێنێ، بۆ ئەو ئامانجانەی کە شەریعەتی خوا داینـاون، جا ئەگەر ماڵ وسامانە، ئەگەر دەسەڵاتە، ئەگەر عیلمە، ئەگەر جاهو توانایە، هەرشتێکە تۆ ئەو نیعمەتە بەکاربێنی لە جێبەجێکردنی فەرمانەکانی خواداو، لە هێنانەدی ئەو ئامانجانەدا کە شەریعەتی خوا فەرمانی پێداون، هەر کاتێك ئینسان ئەگەر بەدڵ‌و بە زمان‌و بە ئەندامەکان ئاوا مامەڵەی لەگەڵ نیعمەتەکانی خوادا کرد، ئەوە مانای وایە سوپاسگوزاریی کردوە بۆ خوا، بۆیەش خوا لە قورئان قەت نەیفەرموە: (قُولُوا شُكراً) بەڵام دەفەرموێ: ﴿... ٱعۡمَلُوٓاْ ءَالَ دَاوُۥدَ شُكۡرٗا ...﴿١٣﴾﴾ سبأ، واتە: ئەی ئالی داوود شوکر بکەن، واتە: ئەنجامی بدەن. نافەرموێ بیڵێن، چونکە (شکر) ناگوترێ‌و دەکرێ، بە دڵ‌و بە زمان‌و بە ئەندامەکان دەکرێ، ئەویش ئەوەیە وەك گوتم کە نیعمەتەکانی خوا لە ڕەزامەندیی خوادا بەکاربێنی، خوا لەو کەسانەمان بگێڕێ، کە زۆر شوکرانە بژێرن بۆ خوا، چونکە دەفەرموێ: ﴿...وَقَلِيلٞ مِّنۡ عِبَادِيَ ٱلشَّكُورُ ﴿١٣﴾﴾ سبأ، واتە: کەم لە بەندەکانی من شوکرانە بژێرن، وە بەڕاستی زەحمەتە کە ئینسان هەموو نیعمەتەکانی خوا بگێڕێتەوە بۆ خوا، وە بەهی خوایان بزانی‌و باسیان بکات‌و، لە ڕەزامەندیی خواشدا بەکاریان بهێنێ، خوا لەو بەندە کەمانەیمان بگێڕێ، بە لوتف‌و کەرەمی خۆی.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی سی و یەکەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان لە ئایەتی ژمارە (١٥٣ تا ١٥٧) لە سوورەتی (البقرة) دەگرێتە خۆی، واتە: پێنج (٥) ئایەت، لەم پێنج ئایەتەدا خوا ﷻ سەرەتا ڕوو لە ئیمانداران دەکات و بە نازناوی ئیمان دەیاندوێنێ و فەرمانیان پێدەکا کە پشت ببەستن بە خۆڕاگریی و بە نوێژ بەرپاکردن، بۆ ئەنجامدانی ئەرکەکانی مسوڵمانەتیی و دینداریيان، پاشان لێیان قەدەغە دەکات، کە وشەی (مردووان) بەکاربێنن بۆ کەسانێك کە لە ڕێگای خوادا دەکوژرێن، وە ڕایدەگەیەنێ: کە لەڕاستیدا ئەوان زیندوون، بەڵام ئێوە هەست بەو زیندوويێتییەی ئەوان ناکەن، پاشان ڕاستییەکی زۆر گەورەیان دەخاتە بەرچاو، کە بریتیە لە یەکێك لە یاساکانی خوا لە ژیانی بەشەرییەتدا، ئەویش تاقیکردنەوەی خوایە بۆ بەندەکانی، وە باسی پێنج لەو شتانە دەکات کە ئینسانەکانیان پێ تاقی دەکاتەوە، دوایيش باسی هەڵوێستی ڕێك و ڕاست دەکات لەبەردەم موصیبەت و ئەو سەختیی و دژوارییانەدا، کە خوا مسوڵمانانیان پێ تاقیدەکاتەوە، وە دەیخاتەڕوو کەسانێك کە هەڵوێستی مسوڵمانانەو ئیماندارانەیان هەیە لە بەرانبەر تاقیکردنەوەکانی خوادا، ئەوانە خوا لێیان ڕازییەو پاداشتێکی بەرزو گەورەیان هەیە.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱسۡتَعِينُواْ بِٱلصَّبۡرِ وَٱلصَّلَوٰةِۚ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴿١٥٣﴾ وَلَا تَقُولُواْ لِمَن يُقۡتَلُ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ أَمۡوَٰتُۢۚ بَلۡ أَحۡيَآءٞ وَلَٰكِن لَّا تَشۡعُرُونَ ﴿١٥٤﴾ وَلَنَبۡلُوَنَّكُم بِشَيۡءٖ مِّنَ ٱلۡخَوۡفِ وَٱلۡجُوعِ وَنَقۡصٖ مِّنَ ٱلۡأَمۡوَٰلِ وَٱلۡأَنفُسِ وَٱلثَّمَرَٰتِۗ وَبَشِّرِ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴿١٥٥﴾ ٱلَّذِينَ إِذَآ أَصَٰبَتۡهُم مُّصِيبَةٞ قَالُوٓاْ إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّآ إِلَيۡهِ رَٰجِعُونَ ﴿١٥٦﴾ أُوْلَٰٓئِكَ عَلَيۡهِمۡ صَلَوَٰتٞ مِّن رَّبِّهِمۡ وَرَحۡمَةٞۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُهۡتَدُونَ ﴿١٥٧﴾ ﴾.

## مانـای وشـه بە وشـەی ئایەتەكـان

((ئـەی ئەوانـەی بڕواتـان هێنـاوە ! كۆمـەك لـە خۆڕاگـریی‌و نوێـژ وەربگـرن، مـسۆگەر خـوا لەگـەڵ خۆڕاگـران دایـە ﴿١٥٣﴾ وە بەوانـەی لـە ڕێـی خـوادا دەكـوژرێن مەڵێن: مردووان بەڵكو زیندوون، بەڵام ئێوە هەسـت ناكەن ﴿١٥٤﴾ وە بێگومـان بـە شـتێك لـە تـرس‌و برسـیەتی‌و كەمـبوون‌و لەنێوچـوونی سـامان‌و نـەفس‌و بەروبوومەكـان، تاقیتـان دەكەینـەوە، وە مـوژدە بـدە بـە خۆڕاگـران ﴿١٥٥﴾ ئەوانـەی كاتێك بەڵایەكیان بەسـەر دێ دەڵێن: ئێمە هی خـواین، وە ئێمـە هەر بۆ لای ویـش (خـوا) دەگەڕێینـەوە ﴿١٥٦﴾ ئـا ئەوانـە صەڵەوات بـەزەیی یـان لـە پەروەردگـاریانەوە دێتە سـەرێ، وە هەر ئەوانە ڕێی ڕاسـتگرتووانن ﴿١٥٧﴾)).

## شـیكردنـەوەی هەندێـك لە وشـەكان

(**بِٱلصَّبۡرِ**): (الـصَّبْرُ: حَبْـسُ النَّـفْسِ عَلَـى مَـا يَقْتَـضِيهِ العَقْـلُ وَالـشَّرْعُ، أو عَمَّـا يَقتَضِيَانِ حَبْسَها عَنـهُ)، (صـبـر) واتـە: خـۆت بووەسـتێنی‌و خـۆت ڕابگـری لەسـەر شـتێك كە عەقـڵ‌و شەرع داوات لـێ دەكات، یـاخود خـۆت بگێڕیـەوە لـە هـەر شـتێك كـە عەقـڵ‌و شـەرع پێـی نـاڕازین، ئەسـڵی وشـەی صـەبر یـانی: (حَبْسُ) واتـە: خۆ ڕاگـراتن.

( **وَلَنَبۡلُوَنَّكُم** ): (ل) لامەكـە بـۆ تەئكیـدە، یـاخود بـۆ (قَـسَم)ە، (ن) نوونەكـە بـۆ تەئكیـدە، واتـە: بـە تەئكیـد تاقیتـان دەكەینـەوە، (لَنَختَـبِرَنَّكُم، لَنَمتَحِـنَّكُمْ)، (بَلَوتُهُ: اختَبَرتُهُ) تاقیم كـردەوە. لـە زمـانی عەرەبیـدا دەگـوترێ: (بَلَـي الثَّـوبُ بِلاً وَبَلائاً) واتـە: بەرگەكە، جلەكە شڕبوو كۆن بوو، وە (إبتلاء) لەوەوە هـاتوە كە شتێك تاقی دەكەیتەوە كـۆنی بكـەی‌و شـڕی بكەی، بۆ وێنـە: كـتێب ئەگـەر زۆرت خوێندەوەو چەند جارت خوێندەوە، شڕدەبێ مەیلەو كۆن دەبێت.

(مُصِيبَةٌ): (وَالمُصِيبَةُ: أصْلُهَا مِن الرَّمْيَةِ ثُمَّ اختَصَّتْ بالنَّائِبَة)، واتە: ئەسڵی وشەی (المُصِيبَةُ) لە تیرەوەیە کە دەهاوێشترێ، پاشان تایبەت کراوە بەو بەڵاو گرفتاریی‌و سەختییانەی کە دێنە سەر ئینسان. (مِن أصَابَهُ السَّهْمُ إذَا وَصَلَ إلى المرمَى) دەگوترێ (أصَابَهُ السَّهْمُ) تیرەکە پێکای ئەگەر گەیشتە ئەو شتەی کە پێوەی نراوە.

(صَلَوَاتٌ): (صَلَوَات) کۆی (صَلَاة)ە، (الصَلاَةُ في اللُّغَة هِيَ الدُّعَاء والتَبريك والتَّمجِيد) واتە: (صَلاَة) لە ئەسڵی زماندا بە مانای پاڕانەوە دێت‌و بە مانای بە پێزکردن‌و بە بەرزگرتن (التَبريك والتَّمجِيد) دێ، (يُقَالُ صَلَّيتُ عَلَيهِ أي دَعوتُ لَهُ وَزَكَيَّتهُ) دەگوترێ: (صَلَوَات)م لێدا، واتە: بۆی پاڕامەوە، وە بە پاک‌و چاکم دانا، وەک پێغەمبەر ﷺ لە فەرموودەیەکدا، فەرموویەتی: {(إذَا دُعِيَ أحَدُكُمْ إلى طَعَام فَلْيُجِبْ، فَإنْ كَانَ مُفْطِرَاً فَلْيَأكُل وإنْ كَانَ صَائِمَاً فَلْيُصَلِّ) (رَوَاهُ مُسْلِمٌ برقم: (٣٥٠٦)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٢٤٦٠)، وَالتِّرمِذِيّ برقم: (٧٨٠)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٥٣٠٦)، وَالنَّسَائِيُّ في (الكبرى) برقم: (٦٦١١)، عَنْ أَبِي هُرَيرَةَ رضي الله عنه}، واتە: ئەگەر یەکێکتان بۆ خواردنێ بانگهێشت کرا، با وەڵام بداتەوە، وە ئەگەر بەڕۆژووش بوو با دووعا بۆ دەعوەتکەر بکات، واتە: بپاڕێتەوە بۆ کابرای خاوەن نان‌و چێشت‌و دووعای خێری بۆ بکات‌و بڵێ خوا پاداشتی خێری بداتەوە. (صَلَوَاتٌ): (وَصَلاَةُ اللهِ لِلمُسلِمِينَ هُوَ في التَّحقِيق: تَزكِيَتهُ إيَّاهُمْ ومِنَ المَلائِكَة هِيَ الدُّعَاء وَالإستغفَار كَمَا هِيَ مِنَ النَّاس)، واتە: صەڵەواتی خوا، کاتێ دەگوترێ: خوا صەڵەواتتان لێدەدا وەک لەو ئایەتەدا هاتوە، صەلاتی خوا بۆ مسوڵمانان، بریتیە لەوە کە خوا پاک‌و چاکیان بکات‌و پلەیان بەرزبکاتەوەو گەشەیان پێبدات، وە صەلاتی فریشتان بریتیە لە پاڕانەوەیان، وە داوای لێبوردن کردن بۆیان لە خوا ﷻ، هەروەها خەڵکیش کە صەڵەوات لێ دەدا، بۆ وێنە: ئێمە کە

صەڵەوات لێ دەنێرین بۆ پێغەمبەر ﷺ، واتە بۆی دەپاڕێینەوە کە خوا پلەو پایەی بەرزبکات، وە (صلاة) بەو عیبادەتە تایبەتەش دەگوترێ کە نوێژە، بۆچی؟ چونکە بەشی زۆری نوێژیش بریتیە لە دووعاو پاڕانەوە.

## هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتەکان

هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو ڕستەیەی، کە دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تَقُولُوا۟ لِمَن يُقْتَلُ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ أَمْوَٰتٌۢ ۚ بَلْ أَحْيَآءٌ ﴾، {(نَزَلَتْ في قتلَى بَدرٍ مِنَ المُسلِمِين، وكَانوا بِضعَةَ عَشَرَ رَجُلاً ثَمَانِيَة مِنَ الأنصَار، وَستة مِنَ المُهَاجِرين، وذَلِكَ أنَّ النَّاسَ كَانوا يَقُولُونَ للرَجُل يقتَلُ فِي سَبيلِ الله: مَاتَ فُلان وَذَهَبَ عَنهُ نَعيم الدُّنيا ولَذتُهَا، فَأنزَلَ الله هَذِهِ الآيَة) (أسباب النزول للنيسابوري، ص: (٣٠)}، نەیسابووریی دەڵێ، ئەم ئایەتە دەربارەی کوژراوەکانی جەنگی بەدر هاتۆتە خوارێ، کە هەشتیان لە پشتیوانان بوونو شەشیان لە کۆچکەران بوون، واتە چواردە کەس بوون، چونکە خەڵك بە پیاوێك کە لە ڕێی خوادا دەکوژرا دەیانگوت: فلان کەس مردو نازو نیعمەتی دنیای لە دەستچوو، خواش ئەم ئایەتەی نارده خوارێو قەدەغەی کرد لە مسوڵمانان کە وشەی مردن بەکاربهێنن بۆ کەسێك کە لە ڕێی خوادا کوژراوە.

## مانای گشتی ئایەتەکان

خوا ﷻ بۆ جاری دووەم لە سوورەتی (البقرة)دا بە وشەی ئیمان مسوڵمانان دەدوێنی ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ﴾، جا لە سوورەتی (البقرة)دا هەمووی یازدە جار (١١) ڕستەی: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ﴾، دووبارە بۆتەوە، دیارە هەرجارێك ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ﴾، دێت، ڕووی لە مسوڵمانانە بەگشتی هەموو ئەوانەی کە خۆیان بە بڕوادار دەزانن، جا لێرەدا دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ﴾، واتە:

ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە ﴿اسْتَعِينُوا بِالصَّبْرِ وَالصَّلَاةِ﴾، کۆمەك وەربگرن لە خۆڕاگریی‌و لە نوێژ، بە واتایەکی دی: پشت ببەستن بە خۆڕاگریی‌و بە نوێژ، بۆچی؟ بۆ بەندایەتیی بۆ خوا، بۆ جێبەجێکردنی ئەرکەکانی سەرشانتان هەوڵبدەن خۆڕاگریی‌و صەبر لەخۆتاندا بێننەدی، وە نوێژکەری باش بن، ئەگەر خۆڕاگربن‌و نوێژکەری باش بن، ئەوە بەهۆی خۆڕاگرییەوە هەموو طاعەتەکان دەتوانن ئەنجام بدەن، ئەگەر نوێژکەری باش بن، لە هەموو قەدەغەکراوەکان دەپارێزرێن، وەك توێژەرەوەکانی قورئان گوتوویانە: (بالصَّبْر يَتَناولُ كُلُّ فَضْلٍ وبالصَّلاة يَجْتَنِبُ كُلُّ فُجُورٍ)، لە ڕاستیدا وایە، بە هۆی خۆڕاگرییەوە، ئینسان هەموو شتێکی باش بەدەستدێنی، وە بەهۆی نوێژیشەوە لە هەموو خراپەیەك دووردەبێ، چونکە خوا بۆخۆی دەفەرموێ: ﴿... إِنَّ الصَّلَاةَ تَنْهَىٰ عَنِ الْفَحْشَاءِ وَالْمُنكَرِ ... ﴿٤٥﴾﴾العنكبوت، نوێژ قەدەغە دەکات، کێ قەدەغە دەکات ؟ خاوەنەکەی ئەو کەسەی کە بەڕاستی ئەنجامی بدات، لە هەر قسەیەکی ناقوڵاو دزێو، وە لە هەر کردەوەیەکی خراپ، یان: ﴿الْفَحْشَاءِ﴾، هەرشتێکە ناشیرین‌و ناقوڵاو لەپێش چاوی خەڵك ناجوان بێت، ﴿وَالْمُنكَرِ﴾یش هەرشتێکە کە عەقڵ‌و فیطرەت‌و لەلایان ناپەسندبێ‌و پێی نا ئاشنابن، نوێژ ئینسان دەگێڕێتەوە لە هەموو ئەو شتانەی کە خراپ‌و ناشیرینن، ﴿إِنَّ اللَّهَ مَعَ الصَّابِرِينَ﴾، بێگومان خوا لەگەڵ خۆڕاگران دایە، واتە: ئەگەر خۆڕاگربن خوا لەگەڵتان دادەبێ، هەڵبەتە ئەم لەگەڵدابوونەی خوا ﷻ، جیایە لە لەگەڵدابوونی خوا، کە دەفەرموێ: ﴿وَهُوَ مَعَكُمْ أَيْنَ مَا كُنتُمْ ۚ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴿٤﴾﴾الحديد، لە هەرکوێیەك بن خوا لەگەڵتانە، چونکە ئەم لەگەڵدابوونە، گشتییە بۆ هەموو دروستکراوەکان‌و، خوا لەگەڵ هەموو دروستکراوەکانی دایە، بەچی ؟ بە تواناو بە زانیاری‌و بە ویست‌و خواستی، بەڵام خوا لەگەڵ ئیماندارانی خۆڕاگر دایە

بەچی ؟ بە تەوفیقو کۆمەککردنو پشتگیرییکردن، ئەوە لەگەڵدابوونێکی تایبەتەو لە لەگەڵدابوون (مَعيَّة)ی گشتی جیایە، ئنجا کە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تَقُولُوا۟ لِمَن يُقْتَلُ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ﴾، خوا ﷻ ئامۆژگارییمان دەکاتو وشەیەکمان لێ قەدەغەدەکات بەکاری بێنینو دەفەرموێ: وە بەوانەی کە لە ڕێی خوادا دەکوژرێن مەڵێن مردوون، واتە وشەی مردنو مردوویان بۆ بەکارمەهێنن، لە سوورەتی (آل عمران)دا دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ قُتِلُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ أَمْوَٰتًۢا ۚ بَلْ أَحْيَآءٌ عِندَ رَبِّهِمْ يُرْزَقُونَ ﴿١٦٩﴾ ﴾، لێرەدا لە {(البقرة)دا} دەفەرموێ: پێیان مەڵێن مردووان، بەڵام لەوێ {لە (آل عمران)دا} دەفەرموێ: بەخەیاڵیشتان دانەیەت ! پاشان دەفەرموێ: ﴿ بَلْ أَحْيَآءٌ ﴾، واتە: مەڵێن: مردووانن بەڵکو بڵێن: ئەوان زیندووانو خاوەنی ژیانن ﴿ وَلَٰكِن لَّا تَشْعُرُونَ ﴾، بەڵام ئێوە هەست پێناکەن، واتە هەست بەو ژیانە تایبەتییە ناکەن، کە ئینسانی لە ڕێی خوادا کوژراو، ئینسانی شەهید، لە دوای بەجێهێشتنی دنیا دەکەوێتە نێوی، کە بریتیە لە ژیانی بەرزەخ (دوایی ئاماژەیەکی بۆ دەکەین)، ئنجا خوای بەرز دێتە سەر ڕاگەیاندنی ڕاستییەکی زۆر گەورە کە ئینسانی مسوڵمانو کۆمەڵی مسوڵمان، هەمیشە پێویستی بەوە هەیە کە دڵی خۆی لەسەر ئەو ڕاستییە بچەسپێنێو، هەمیشە لەنێو دڵو مێشکیدا درەوشاوەو چەسپاوبێ، دەفەرموێ: ﴿ وَلَنَبْلُوَنَّكُم بِشَىْءٍ مِّنَ ٱلْخَوْفِ وَٱلْجُوعِ وَنَقْصٍ مِّنَ ٱلْأَمْوَٰلِ وَٱلْأَنفُسِ وَٱلثَّمَرَٰتِ ۗ وَبَشِّرِ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴾، وە بە تەئکیدو دڵنیایی (مسۆگەرو دڵنیابن) تاقیتان دەکەینەوە بە شتێك لە ترسو برسیەتیو کەمیی ماڵو سامانو کەمیی نەفسەکان (واتە: کەسوکارتان)و کەمیی بەروبوومو دەرامەت، واتە: بە هەموو ئەوانە تاقیتان دەکەینەوە، ترستان دێتە ڕێ بەرانبەر دوژمنانو، لەگەڵ مەرگدا ڕووبەڕوو دەبنەوە، مادام بەڕاستی مسوڵمان بن، وە لەگەڵ برسیەتییدا ڕووبەڕوو دەبنەوەو

تووشی برسیەتیی دەبن‌و تووشی هەژاریی‌و نەداریی دەبن‌و، تووشی کۆچ‌و کۆچبار دەبن، وە تووشی لەدەستدانی ماڵ‌و سامان دەبن، وە تووشی لەدەستدانی کەسوکارو خۆشەویستانتان دەبن، وە تووشی لەدەستدانی بەروبووم‌و بەرهەمەکانتان دەبن ﴿ وَبَشِّرِ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴾، بەڵام خۆڕاگران دڵخۆشبکەو موژدەیان پێبدە، بەچی ؟ بەوەی کە دوایی باسی دەکات، ئنجا دوایی باسی خۆڕاگرانمان بۆ دەکات، کە ئایا خۆڕاگران کێن؟ ﴿ ٱلَّذِينَ إِذَآ أَصَٰبَتۡهُم مُّصِيبَةٞ قَالُوٓاْ إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّآ إِلَيۡهِ رَٰجِعُونَ ﴾، لێرەدا گرنگترین هەڵوێستی خۆڕاگرانمان بۆ دەخاتەڕووو دەفەرموێ: خۆڕاگران کەسانێکن ئەگەر بەڵایەکیان هاتە سەر، بەڵایەکیان تووشبوو، دەڵێن: ئێمە هی خواین‌و بۆ لای ویش دەچینەوە، واتە: خوا ﷻ کە ئەو بەڵایەی بەسەر ئێمە هێناوە، ئێمە موڵکی خۆینیی‌و تاقیکردووینەوە، وە هەر بۆ لای ویش دەچینەوە، تاکو پاداشتمان بداتەوە، کەواتە: کە بەڵایەکمان بەسەرهاتوە، ئەوە شتێکی هەقەو ڕاستە، خوای پەروەردگار لە موڵکی خۆیدا تەصەڕڕوفی کردوە، ئەوە یەك، پاشان ئێمە لێی ناچینە زەرەێ، چونکە ئێمە دەچینەوە بۆ لای خوا، تاکو پاداشتەکەمان بداتەوە، جا دەفەرموێ: ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ عَلَيۡهِمۡ صَلَوَٰتٞ مِّن رَّبِّهِمۡ وَرَحۡمَةٞ ﴾، ئا ئەوانە پەروەردگاریان صەڵەواتیان بۆ دەنێرێ‌و بەزەیی پێیاندا دێ، کە وەك گوتم (صلاة) لە خوای پەروەردگارەوە، بریتیە لەوە کە ئینسان چاك‌و پاك بکات‌و تەزکیەی بکات‌و گەشەی پێبدا ﴿ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُهۡتَدُونَ ﴾، وە ئا ئەوانە کەسانێکن کە ڕێی ڕاست گرتوون، چونکە ڕێی ڕاست گرتن، ئەوەیە کە لە بەرانبەر بەڵا (مُصِيبَة)دا، نەچەمێی‌و کول نەبی‌و نەبەزی‌و پاشەکشە نەکەی، کاتێ لەسەر خواو لەسەر دینی خوا تووشی بەڵاو سەختییەك دێی، بە ئاسایی وەریبگری بڵێی: من هی خوام‌و بەندەی خوام‌و، بۆ لای خواش دەچمەوە، هەرکەسێك بەڕاستی قەناعەتی بەوەبێ کە هی خوایەو بۆ لای خواش دەچێتەوە، گوێ ناداتە بەڵا (مُصِيبَة)تەکان‌و پێیان ناشڵەژێ.

## چەنــد مەســەلەیـەكـی گرنــگ

**مەسـەلەی یەكـەم:** كە دەفەرموێ: ﴿ ٱسْتَعِينُوا۟ بِٱلصَّبْرِ وَٱلصَّلَوٰةِ ﴾، پشـت ببەسـتن بە خۆڕاگریی‌و بە نوێژ، یاخــود كۆمـەكیی وەرگـرن لـە خۆڕاگـریی‌و لـە نوێـژ، ئـەی ئەوانـەی ئیمانتـان هێنـاوە! سـیفەتی صـەبرِ زۆر لـە خۆتانـدا بـچەسپێنن تاوای لـێدیّ نازناوی (صابر) خۆڕاگریی بتانگرێتـەوە، چونكە (صابر) لەسـەر وەزنـی (فَاعِـل)ە، واتـە: كەسێك كـە هەمیشـە خۆڕاگــرە، بـەلاّم (صَبَرَ) واتـە: خۆی ڕاگـرت، كەواتە: مانای ئەم ڕستەیە ئـاوایە: ئێـوە كۆمەكیی لـە خـۆڕاگریی وەربگـرن‌و لـە خۆتانـدا بیكەنـە سیفەتێكی چەسپاو، وە كۆمـەكییش لـە نوێـژ وەربگـرن، بـۆ ئـەوەی كـە بتـوانن بـەهۆی صـەبرەوە هـەموو فەرمانـەكانی خـوا جێبەجێ بكـەن، وە بـەهۆی نوێژیـشەوە، سـەلامەت‌و پارێزراوبن‌و نوێـژ بۆتـان ببێتـە قــەڵاو پەرژینێــك، كـە لـە هەرچــی ناشــەرعیی‌و غەڵــەت‌و پەڵـەت‌و خراپەیە بتـانپارێزیّ، ئنجـا زۆربەی زانایـان دەڵێن: صەبرِ سێ بەشـە:

١) (الصَّبـر عَلَى الطَّـاعَة) خۆڕاگـریی لەسـەر فەرمانبەریی.

٢) (الصَّبـر عَن الـمَعصِيَة) خۆڕاگریی لە بەرانبەر سـەرپێچییكـردندا.

٣) (الصَّبـر عَلَى الـمُصِيبَة) خۆڕاگریی لە بەرانبەر بـەلاّدا.

١/ (<u>الصَّبـر عَلَى الطَّاعَة</u>) خۆڕاگریی لەسەر طاعەت‌و فەرمانبەریی خوا، ئەوەیە كـە هەرچی خوا فەرمانی پێكردوەو هەر ئەركێك كە خستوویەتە سەرشـانت، بەپێی توانا خۆڕاگربی‌و ئەنجامی بدەی، چونكە هیچ فەرمانێكـی خـواو هیچ ئەركێكـی شـەرعیی، بـەبێ خۆڕاگــریی ئـەنجام نـادرێ، ئەگـەر چـیكڵدانەت گـچكەبێ، نە نوێژەكانت وەك پێویست بـۆ دەكـرێ، نـە ڕۆژووت بـۆ دەگیـرێ، نە حەجت بۆ دەكـرێ، نـە جیهادت بۆ دەكرێ، نە صیلەی ڕەحمی خزمایـەتیت بۆ جێبەجێ دەكرێ، نە بانگەوازت بۆ دەكرێ، بەبێ صـەبرو خۆڕاگـریی هیچ شتێكت بۆ ناچێتــە سـەر، بۆیە دەبێ پشـووت درێـژبی‌و خــۆڕاگـربی.

٢/ (الصَّبر عَن المَعْصيَة) خۆڕاگریی لەسەر گوناح، واتە: خۆڕاگربی نەهێڵی تووشی گوناح بی، خۆڕاگرتن لە بەرانبەر گوناحیشدا، واتە: تووشی گوناح نەبوونیش، بەبێ صەبر دیسان نایەتە دی.

٣/ (الصَّبر عَلَى المُصيبَة) خۆڕاگریی لە بەرانبەر بەلا (مُصيبَة)داو لە بەرانبەر ئەو سەختییانەدا كە دێنە ڕێت كە نەلەخشاوبی لەبەردەمیانداو خۆڕاگربی، یانی: چی ؟ واتە: سكالاًنەكەی‌و جەزەع‌و فەزەع نەكەی‌و، چیلكدانەت گچكە نەبێ‌و لالانەوەو پاڕانەوەو نووزانەوە لەبەر خەڵك نەكەی ! ئەها ! یەعقووب عليه السلام كاتێك كە كوڕەكانی پێی دەڵێن: تۆ زۆر باسی یوسف دەكەی، دەڵێ: ﴿إِنَّمَآ أَشۡكُواْ بَثِّي وَحُزۡنِيٓ إِلَى ٱللَّهِ وَأَعۡلَمُ مِنَ ٱللَّهِ مَا لَا تَعۡلَمُونَ ٨٦﴾ يوسف، واتە: من خەم‌و پەژارەو مەراقی خۆم تەنیا لەگەڵ خوا باس دەكەم، وە لەلایەن خواوە شتێك دەزانم كە ئێوە نایزانن، كەواتە: ئەگەر تۆ شتی خۆت لەگەڵ خوا باسبكەی، ئەوە مانای وانیە كە بێ صەبرییت كردوە، بەلام ئەگەر بێت‌و لەگەڵ بەندەكاندا باسی بكەی، چونكە هیچیان پێ ناكرێ، ئەوە شتێكی خراپە، هەڵبەتە ئەگەر باسی گرفت‌و كێشەیەكی خۆت بكەی كە پێویست بكات، بۆ ئەوەی بە زاڵمت تێنەگات، یان زوڵمت لێ نەكرێ، ئەوە هەڵوێردراوە لەو حوكمە گشتییە، بەلام بەگشتی ئینسان نابێ گرفتاریی‌و كێشەو سەختییەكانی خۆی بۆ خەڵكی باس بكات، بەلام لەنێوان خۆت‌و خواداو لە كاتی پاڕانەوەدا، خراپ نیە، هەڵبەتە ئەگەر باسیشی نەكەی خوا هەر ئاگای لێیە، بەلام ئەگەر باسیشی بكەی پێچەوانەی صەبر نیە، وەك یەعقووب عليه السلام باسی كردوە، وە پێغەمبەر ﷺ دەربارەی ئارامگرتن لە فەرمایشتێكدا، فەرموویەتی: {(عَجَبًا لأَمْرِ المُؤمِنِ، إنَّ أمْرَهُ كُلَّهُ خَيرٌ لَهُ، وَلَيسَ ذَلِكَ لأَحَدٍ إلاَّ لِلْمُؤمِنِ، إنْ أصَابَتْهُ سَرَّاءُ شَكَرَ، فَكَانَ خَيرًا لَهُ، وَإنْ أصَابَتْهُ ضَرَّاءُ صَبَرَ، فَكَانَ خَيرًا لَهُ) (رَوَاهُ أَحْمَدُ برقم: (١٨٨٣٦)، وَمُسْلِمٌ برقم:

(٧٤٢٥)، وَابْنُ حِبَّانَ بِرقم: (٢٨٩٦)، عَنْ صُهَيْبٍ رضي الله عنه}، واتە: ئیش و حاڵی ئینسانی بڕوادار سەیرە! حاڵ و ئیشی کاری ئەو هەمووی هەر خێرو چاکەیە، ئەوەش بۆ هیچ کەسێك نیە جگە لە ئیماندار، ئەگەر خۆشیی تووش هات سوپاسگوزاریی لەسەر دەکات و پاداشتی بۆ هەیە، وە ئەگەر نارەحەتیی و ناخۆشیی تووش هات، خۆی لە بەرانبەر ڕادەگری و پاداشتی هەیە.

ڕاستە ژیانی ئینسان یان خۆشییە، یان ناخۆشییە، ئنجا ئەگەر خۆشیی بوو بە سوپاسگوزاریی (شکر) لەگەڵی ڕووبەڕوو ببەوەو ئەگەر ناخۆشیی بوو بە صەبر، بۆیە خوا تعالى لە قورئاندا لە چەند شوێندا باسی (صبر) و (شکر) بەیەکەوە دەکات، وەك دەفەرموێ: ﴿... إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِّكُلِّ صَبَّارٍ شَكُورٍ ۞﴾ إبراهيم، واتە: بێگومان لەوەدا نیشانەی زۆر هەن بۆ هەرکەسێکی زۆر خۆڕاگریی زۆر سوپاسگوزار، ئنجا دەربارەی یارمەتی وەرگرتن لە نوێژ لە پێغەمبەرەوە ﷺ هاتوە: {(عَنْ حُذَيْفَةَ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ إِذَا حَزَبَهُ أَمْرٌ صَلَّى) (رَوَاهُ أَبُو داود بِرقم: (١٣١٩)، وَحَسَّنَهُ الأَلْبانِي فِي (سُنَن أبِي داود)}، واتە: (حُذَيْفَةَ) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ ئەگەر ئیشێك نارەحەتی دەکرد نوێژی دەکرد، جا لێرەدا (نوێژی دەکرد) دەگونجێ بەمانای نوێژی زانراوبێ، وەك ئەو خوا پەرستییە تایبەتییە، دەشگونجێ مەبەست لە دووعاو پاڕانەوەبێ، کە ئەویش بەشی بنەڕەتیی و بنچینەی نوێژە.

**مەسەلەی دووەم:** ئەوەیە کە لێرەدا خوا تعالى مسوڵمانان قەدەغە دەکات لەوەی کە وشەی مردووان بۆ کوژراوانی خۆیان بەکاربهێنن، بۆچی؟ چونکە لەڕاستیدا تەنیا خەڵکی سادەو سەرکێڵ تەنیا ئەم ژیانی دنیایە بە ژیان دەزانن، بەڵام لە ڕوانگەی ئیمان و ئیسلامەوە، لە دوای ئەم قۆناغەی ژیانی دنیا، ژیانی دیکەش هەیەو دێ، کە وەك زانایان دەڵێن: ئینسان سێ قۆناغی ژیانی هەن:

١) - ژیانی دنیا. ٢) - ژیانی بەرزەخ. ٣) - ژیانی قیامەت.

ئەم سێ قۆناغە هەرکامێکیان ئەوەی دواتر لەوەی پێش خۆی گەورەترو گرنگترە، ژیانی بەرزەخ لە ژیانی دنیا گەورەترەو گرنگترە، ئینسان لە ژیانی دنیادا پەنجا (٥٠)، شەست (٦٠) ساڵ، ئەوپەڕی سەد (١٠٠) ساڵ دەمێنێتەوە، بەڵام لە ژیانی بەرزەخدا هەزاران ساڵ دەمێنێتەوە، کە هەر خوا بۆخۆی دەزانێ چەندە؟! ژیانی قیامەتیش ئەوە هەر کۆتایی نایەت، کەواتە: ژیانی بەرزەخ لە هی دنیا تەواوترە، وە فەرمایشتی پێغەمبەر ﷺ دەربارەی ژیانی شەهیدان زۆرن، کە چۆن لە نازو نیعمەتەکانی بەهەشتدان لە کەوڵو قالبی باڵندەی سەوزدا، وە لە باغەکانی بەهەشتدا ئەو چڵو ئەو چڵ دەکەن، وەك لە هەردوو (صحیح)ی ئیمام بوخاریی و موسلیمدا هاتوە[1] کە إن شاء الله لە ئایەتەکانی دیکەدا، کە ئەو مناسەبەتە دێتەوە پێش، باسیان دەکەین.

**مەسەلەی سێیەم:** ئەوەیە کە تاقیکردنەوەی خوا بۆ بەندەکانی شتێکی حەتمییە، جارێ خوا ﷻ مرۆڤایەتی بە گشتی تاقی دەکاتەوە، چونکە دەفەرموێ: ﴿ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلْمَوْتَ وَٱلْحَيَوٰةَ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا ۚ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْغَفُورُ ﴿٢﴾ ﴾ ملك، کەواتە: بەگشتی مرۆڤایەتی لە تاقیکردنەوە دایە، ئیماندارانیش بە تایبەت تاقی دەکرێنەوە، وەك دەفەرموێ: ﴿ وَلَنَبْلُوَنَّكُم بِشَىْءٍ مِّنَ ٱلْخَوْفِ وَٱلْجُوعِ وَنَقْصٍ مِّنَ ٱلْأَمْوَٰلِ وَٱلْأَنفُسِ وَٱلثَّمَرَٰتِ ﴾، وەك لە سەرەتای سوورەتی (العنكبوت)دا دەفەرموێ: ﴿ الٓمٓ ﴿١﴾ أَحَسِبَ ٱلنَّاسُ أَن يُتْرَكُوٓا۟ أَن يَقُولُوٓا۟ ءَامَنَّا وَهُمْ لَا يُفْتَنُونَ ﴿٢﴾ ﴾، واتە: ئایا خەڵك پێیان وایە کە گوتیان: ئیمانمان هێناوە، تاقییان ناکەینەوە ! کەواتە: ئیمانداران تاقیکردنەوەیەکی تایبەتی تریشیان هەیە لە

---

١) بۆ وێنە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (إنَّ أرواح الشهداء في طيرٍ خُضرٍ تَعْلُقُ من ثمر الجنّة) ملك: الجنائز (٥١٦/٥٦٦)، أحمد : (١٥٧٧٧)، الترمذي (١٦٤٠)، والنسائي: (٢٠٧٢)، وابن ماجة: (٤٢٧١)، وە بڕوانە: صحيح مسلم: (١٨٨٧) کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (أرواحهم في جوف طيرٍ خُضرٍ لها قناديل معلَّقة بالعرش تَسرحُ من الجنَّة حيث شاءت).

تاقیکردنەوەی خەڵکی بەگشتی، ئنجا پێغەمبەران ﷺ و پێشەوایان و زانایانی مسوڵمان لەنێو ئیمانداراندا، تاقیکردنەوەیەکی تایبەتیی تایبەتییشیان هەیەو ئەوان قورستریش تاقی دەکرێنەوە.

**مەسەلەی چوارەم:** ئەوەیە کە خوا ﷻ گوتنی: ﴿ إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّآ إِلَيۡهِ رَٰجِعُونَ ﴾ ی کردوە بە پێناسەی خۆڕاگران، چونکە بەڕاستی کەسێك کاتێك بەڵاو نارەحەتییو سەختییو دژواریی تووش دێ، ئەم وشەیەی بە زار دابێو بڵێ من هی خوام بۆلای خواش دەگەڕێمەوە:

یەکەم: زۆر هەست بە تاڵایی ئەو بەڵاو موصیبەتە ناکات، وە لە ژێریدا ناچەمێ.

دووەم: بەڕاستی کاتێك ئەو قسەیەی بۆ دەگوترێ، کە ئیمانێکی باشی هەبێ، وە ئەوە مانای وایە ئینسانێکی خۆڕاگرو پشوو درێژە.

**مەسەلەی پێنجەم:** ئەوەیە کە خوا ﷻ سێ شتی بۆ خۆڕاگران کردۆتە موژدە، دەفەرموێ: ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ عَلَيۡهِمۡ صَلَوَٰتٞ مِّن رَّبِّهِمۡ وَرَحۡمَةٞۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُهۡتَدُونَ ﴾.

یەکەم: خوا صەڵەواتیان لێدەدا، صەڵەواتی خواش وەك پێشتر باسمان کرد، ئەوەیە کە خوا ئەو ئینسانە چاك بکاو پاکی بکاو گەشەی پێبداو چی باشە بۆی بکات.

دووەم: ڕەحمەتیش ئەوەیە، کە بەزەیی پێدا بێتەوە.

سێیەم: خوا ﷻ موژدەش دەدا کە ئەو جۆرە کەسانە ڕێ ڕاست گرتوون، واتە: بەملاولادا نەچوون، بەڵکو ڕاستەشەقامی خوای پەروەردگاریان گرتوە.

خوا بە لوتفو کەرەمی خۆی لەو کەسانەمان بگێڕێ کە لە بەردەم بەڵاو موصیبەتەکاندا، بە دڵو گیان دەڵێن: ئێمە هی خواین، وە بۆ لای خواش دەچینەوە.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی سی و دووەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

لەم دەرسەماندا ئایەتەکانی ژمارە (١٥٨ تاکو ١٦٢)، واتە: پێنج (٥) ئایەت لە سوورەتی (البقرة)دا تەفسیر دەکەین، لەم پێنج ئایەتەدا خوا ﷻ سەرەتا باسی صەفاو مەروەو هاتن‌وچوونی نێوانیان دەکات، کە ئەوانە دوو درووشمی دینی خوای پەروەردگارن، وە ئینسان گوناحی ناگاتێ، ئەگەر بێت‌و بچێت‌و طەوافی نێوانیان بکات. پاشان باسی تاوانێکی یەکجار گەورە دەکات کە کەسانێك ئەنجامی دەدەن خوا لە دینی خۆی شارەزایان دەکات، بەڵام ئەوان ئەو بەڵگە روونانەی کە لە دینی خوادا هەن‌و، ئەو هیدایەتەی کە خوا ئەوانی پێ بەهرەمەند کردوە، بە خەڵکی راناگەیەنن‌و دەیشارنەوە، وە باس دەکات ئەوان چ سزایەکی سەختیان هەیە لە دوارۆژداو خواو هەموو نەفرینکەران نەفرینیان لێ دەکەن، پاشان باسی ئەو کافرانە دەکات کە بە بێبڕوایی دەمرن، چ سزایەکیان هەیە، وە چۆن لە دوارۆژ لە دۆزەخدا بە هەمیشەیی دەمێننەوە، وە سزاشیان لەسەر سووك ناکرێ‌و بە چاوی بەزەیی‌و رەحمەتیش تەماشا ناکرێن.

﴿ إِنَّ ٱلصَّفَا وَٱلْمَرْوَةَ مِن شَعَآئِرِ ٱللَّهِ ۖ فَمَنْ حَجَّ ٱلْبَيْتَ أَوِ ٱعْتَمَرَ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِ أَن يَطَّوَّفَ بِهِمَا ۚ وَمَن تَطَوَّعَ خَيْرًا فَإِنَّ ٱللَّهَ شَاكِرٌ عَلِيمٌ ﴿١٥٨﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكْتُمُونَ مَآ أَنزَلْنَا مِنَ ٱلْبَيِّنَٰتِ وَٱلْهُدَىٰ مِنۢ بَعْدِ مَا بَيَّنَّٰهُ لِلنَّاسِ فِى ٱلْكِتَٰبِ ۙ أُو۟لَٰٓئِكَ يَلْعَنُهُمُ ٱللَّهُ وَيَلْعَنُهُمُ ٱللَّٰعِنُونَ ﴿١٥٩﴾ إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُوا۟ وَأَصْلَحُوا۟ وَبَيَّنُوا۟ فَأُو۟لَٰٓئِكَ أَتُوبُ عَلَيْهِمْ ۚ وَأَنَا ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١٦٠﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَمَاتُوا۟ وَهُمْ كُفَّارٌ أُو۟لَٰٓئِكَ عَلَيْهِمْ لَعْنَةُ ٱللَّهِ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةِ وَٱلنَّاسِ أَجْمَعِينَ ﴿١٦١﴾ خَٰلِدِينَ فِيهَا ۖ لَا يُخَفَّفُ عَنْهُمُ ٱلْعَذَابُ وَلَا هُمْ يُنظَرُونَ ﴿١٦٢﴾ ﴾.

## مانای وشە بە وشەی ئایەتەکان

((بێگومان صەفاو مەروە لە درووشمەکانی خوان، جا هەرکەس حەجی ماڵی (خوای) کرد یان عومرەی کرد، گوناهی ناگات کە لە دەوریان بسوورێ، وە هەر کەسێکیش چاکەی زیادی کرد، ئەوە خوا سوپاسگوزاری زانایە ﴿١٥٨﴾ دڵنیابن ئەوانەی کە ئەو بەڵگە ڕوونو ڕێنمایییە دەشارنەوە، دوای ئەوەی لە کتێبدا بۆ خەڵکیمان خستۆتەڕوو، ئەوانە خوا نەفرینیان لێ دەکاتو سەرجەم نەفرینکەرانیش نەفرینیان لێ دەکەن ﴿١٥٩﴾ جگە لەوانەی دەگەڕێنەوەو چاکسازیی دەکەنو، ئەوەی شاردوویانەتەوە ڕایدەگەیەنن، ئا ئەوانە لێیان خۆش دەبم، وە من زۆر تۆبە وەرگرێکی بەخشندەم ﴿١٦٠﴾ بەڕاستی ئەوانەی بێبڕوابوونو بەبێبڕوایی دەمرن، ئەوانە نەفرینی خواو فریشتەکانو تێکڕای خەڵکیان لێیە ﴿١٦١﴾ بە هەمیشەیی تێیدا (واتە: لە دۆزەخدا) دەمێنێتەوە، ئازاریان لەسەر سووك ناکرێو بە (چاوی بەزەیی) سەیر ناکرێن ﴿١٦٢﴾)) .

## شیکردنەوەی هەندێك لە وشەکان

**(شَعَآئِرِ ٱللَّهِ):** (الشَعَائِر: جمعُ شَعِيرَة)، (الشَعَائِر) کۆی (شَعِيرَة)یە، (شَعِيرَة) واتە: درووشم، نیشانە، بەتایبەتی خوا پەرستییەکانی حەج، کە وشەی (شَعَائِر)، وە وشەی (مَشَاعِر)یشیان بۆ بەکاردێ، (مَشَاعِر)یش کۆی (مَشعَر)ە، (سُمِّيَ بِذَلِكَ لأَنَّهَا تُشْعَرُ، أي: تُعَلَّمُ بِأَنْ تُدْمَى بِشَعِيرَةٍ، أي: حَدِيدَةٍ يُشْعَرُ بِهَا) بەتایبەت ئەو ئاژەڵەی دەبردرێ بۆ حەج، جا حوشترە، ڕەشە وڵاخە، مەڕە، بزنە ... ئەوەی کە نیشانەدار دەکرێ، واتە: خوێنی لێ دەهێنرێ، بەتایبەتی ئەگەر حوشتربێ لە سەنامەکەی، {دونگەکەی} خوێنی لێ دەهێنرێ، بۆیە وای پێ گوتراوە، چونکە نیشانەدار دەکرێ بە

(شَعِيـرَة) کـە (شَعِيـرَة) بریتیە لە ئاسنێك، چەقۆیەك کە دونگی {سەنامی} حوشتـری پێ برینـدار دەکرێ، وە لـەوەوە هـەموو خـوا پەرسـتییەکانی حـەج نـاوبـراون بە (شَعَائِر الحج)، چونکە هـەموویان درووشـمو نیـشـانەی ئـەوەن کە تۆ بەندایەتیی بۆ خـوا دەکـەی.

(تَطَوَّعَ)؛ واتە: خۆبەخشـانە ئەنجامیـدا، (تَطَـوُّع) لـە بەرانبەریـدا (فَرْض)ە، فـەرز ئەوەیە کە لەسـەرت پێویستە بیکـەی‌و (تَطَـوُّع) ئەوەیە کە لەسـەرت پێویست نیـە بیکـەی، بـەڵام خۆبەخـشـانەو بـەزیادە ئـەنجامی دەدەی .. (الطَّـوْعُ: الإنقـيَادُ ويُضَـادُّهُ الكُـرْهُ) (طَوْعُ) بریتیە لە ملکەچیی، وە پێچەوانەی (كُـرْهُ) پێنـاخـۆش بوونـە، (والتَّطَـوُّعُ فـي الأصْـلِ: تَكَلُّـفُ الطَّاعَـةِ، وهُـوَ فـي التَّعَـارُفِ التَبَـرُّعُ بِمَا لاَ يَلْـزَمُ كَالتَّنَفُّـلِ)، وشـەی (التَّطَوُّعُ) بریتیـە لـەوەی کـە تـۆ فەرمـانبەرییـەك ئەنجـام بـدەی بـۆ خـواو زۆر لـە خـۆت بکـەی، لـە زاراوەی زانایانیـشـدا (تَطَـوُّع) بریتیـە لەوەی کە تـۆ تەبـەروع (تَبَـرُّع) بکـەی، واتـە: شـتێك ئەنجـام بـدەی کـە لەسـەرت پێویـسـت نیـە ئـەنجامی بـدەی‌و لەسـەرت پێویست نەکـراوە، بۆ وێنـە: نوێژی سوننەت، ڕۆژووی سوننەت.

(لَّعۡنَةُ ٱللَّهِ)؛ وشـەی (لَعْن) بـە کوردیی بـە نـەفرین لێکـدراوەتەوە، (اللَّعْن: الطَّرْدُ والإبْعَـادُ عَـلَى سَبِيلِ السَّخَطِ)، واتـە: (لَـعْن) بریتیـە لـە دەرکـردن‌و دوورخستنەوە بە شێوەی لـێ تووڕە بوون (وَذَلِكَ مِنَ اللهِ تَعَالـى فـي الآخِرَةِ عُقُوبَـة، وَفـي الدُّنيـا انقِطَـاعٌ مِن قبُـولِ رَحمَتِـهِ وتَوفِيقِـهِ، وَمِن الإنسَـان دُعاءُ عَلَى غَيرِهِ)، واتە: وشەی (لَعْن)، ئەگەر خوا ﷻ (لَعْنَة) لە کەسێك یان شتێك بکـات، واتـە: لـە دوارۆژدا لـە بـەزەیی خـۆی دووری خـستۆتـەوەو لـە دنیـادا لـە تەوفیق‌و یارمەتی‌و هیدایەتی خۆی دووری خستۆتەوە، وە ئەگەر بـۆ ئینـسـان بەکـاربێت‌و ئینـسـان (لَعنَـة) لـە شـتێك بکـات، واتـە: دووعـای خراپـی لـێ دەکـات‌و دەیـەوێ لە ڕەحمـەتی خوا دوورکـەوێتەوە.

(وَلَاهُمْ يُنظَرُونَ): (النَّظَـرُ: الانْتِظَـارُ: يُقَـالُ نَظَرْتُـهُ وَانتَظَرْتُـهُ وأَنظَرْتُـهُ أي: أَخَّرْتُهُ) بە سێ وشان هاتوە: (نَظَـرْتُهُ وَانتَظَـرْتُهُ وأَنظَرْتُهُ)، (وَلَاهُمْ يُنظَرُونَ) واتە: چاوەڕێیان ناکرێ کە بگەڕێنەوە بۆ لای خواو تۆبە بکەن، یاخـود داوای لێبوردن بکەن لە خوا، یاخود لە (أُنظِرَ)ەوە هاتوە، واتە: (أُخِّرَ) یانی: مۆڵەت نادرێن‌و دواناخرێن کە سزا نەدرێن‌و ئازار نەدرێن، یاخود لەوەوە هاتوە دەڵێ (نُظِرَ إلَيهِ) واتە: تەماشاکرا، یانی: بەچاوی بەزەیی‌و ڕەحمەت تەماشا ناکرێن.

## هـۆی هاتنە خـوارەوەی ئایەتەکـان

١/ هـۆی هاتنـە خـوارەوەی ئـەم ڕسـتە قورئانییـەی، کـە دەفـەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلصَّفَا وَٱلْمَرْوَةَ مِن شَعَآئِرِ ٱللَّهِ فَمَنْ حَجَّ ٱلْبَيْتَ أَوِ ٱعْتَمَرَ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِ أَن يَطَّوَّفَ بِهِمَا وَمَن تَطَوَّعَ خَيْرًا فَإِنَّ ٱللَّهَ شَاكِرٌ عَلِيمٌ﴾، چـەند فەرموودەیـەك هـاتوە، کـە ئەمـە لـە هەموویان زیاتر هـۆی هاتنـە خوارەوەکەی ڕوون دەکـاتەوە: {(عَنْ عُروَةَ رضي الله عنه قَالَ: قُلْتُ لِعَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنهَا أَرَأَيتِ قَولَ اللهِ تَبَارَك وَتعَالى: ﴿إِنَّ ٱلصَّفَا وَٱلْمَرْوَةَ مِن شَعَآئِرِ ٱللَّهِ فَمَنْ حَجَّ ٱلْبَيْتَ أَوِ ٱعْتَمَرَ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِ أَن يَطَّوَّفَ بِهِمَا﴾ فَمَا أَرَى عَلَى أَحَدٍ (جنـاحـاً) شَيئاً أَن لاَ يَطَّوَّف بِهِمَا؟ فَقَالَت عَائِشَةُ: بِئْسَما قُلْتَ يَا ابنَ أُختِي إِنَّهَا لَوكَانَت كَمَا تَقُول كَانَت: (فَلاَ جُنَاحَ عَلَيهِ أَن لاَيَطَّوفَ بِهِمَا)، وَلَكِنَّهَا إِنَّمَا أُنزِلَتْ هَذِهِ الآيَة فِي الأَنصَار كَانُوا قَبْلَ أَن يُسْلِمُوا كَانُوا يُهِلُّونَ لِمَنَاةِ الطَّاغِيَةِ الَّتِي كَانُوا يَعبدُونَهَا عِندَ المُشَلَّلِ وَكَانَ مَن أَهَلَّ لَهَا يتحرَّج أَنْ يَطَّوَّفَ بالصَّفَا والمَرْوَة فَسأَلوا عَن ذَلِكَ رَسُول الله ﷺ فَقَالُوا: يَا رَسُول الله إِنَا كُنَّا نَتحرَّج أَن نَطَّوَّفَ بالصَّفَا والمَرْوَة فِي الجَاهِلِيَة، فَأَنْزَلَ اللهُ ﴿إِنَّ ٱلصَّفَا وَٱلْمَرْوَةَ مِن شَعَآئِرِ ٱللَّهِ ...﴾، قَالَتْ: عَائِشَةَ ثُمَّ سَنَّ رَسُولُ اللهِ الطَّوَّاف بِهِما فَلَيسَ لأَحَدٍ أَن يدع الطَّوَّافِ بِهِمَا)

(مُتَّفَقٌ عَلَيهِ، والصحيح المُسنَد، ص (٢٩-٣٠)، وصحيح أسباب النزول، ص: (٣٠)}، واتە: عورِوەی کوڕی زوبێری کوڕی عەوام {کە دەکاتە کوڕی خوشکی عائیشە، چونکە کوڕی (أسماء)یە کە خێزانی زوبێر بووەو خوشکی عائیشە بووە، (أسماء)و (عائشة) کچی (أبوبکر)ن (خوا لە هەموویان ڕازی بێ)} دەڵێ بە (عائشة)م گوت تۆ تەماشای ئەم ئایەتە دەکەی، کە دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلصَّفَا وَٱلْمَرْوَةَ مِن شَعَآئِرِ ٱللَّهِ ...﴾، من پێم وایە ئەگەر کەسێك لەنێوان صەفاو مەروەشدا هاتوچۆ نەکات، گوناهی ناگاتێ، عائیشەش گوتی: قسەیەکی زۆرخراپت، کرد ئەی خوشکەزام، ئەگەر وەك تۆ لێکتداوەتەوە مانایەکەی وابووایە، دەبوو ئاوا بووایە: (فَلاَ جُنَاحَ عَلَيهِ أن لاَيَطَّوَّفَ بِهِمَا) نەك ﴿فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِ أَن يَطَّوَّفَ بِهِمَا﴾، واتە: گوناحی ناگاتێ، ئەگەر طەوافیان لەنێواندا نەکات، {بەڵام ئێستا فەرموویەتی گوناحی ناگاتێ، ئەگەر طەوافیان بە نێواندا بکات، ئنجا ڕوونی کردەوە گوتی}: بەڵام ئەوە کاتێك هاتە خوار کە ئەنصارییەکان، (واتە: ئەوس و خەزرەج) پێش ئەوەی مسوڵمان بن، بتێکیان پەرستوە بەناوی (مَنَاة)، لەلای (مەشلەل)، جا هەر کەس لەلای (مَنَاة) ئیحرامی حەجی بەستبایە پێیان گوناح بوو کە لەنێوان صەفاو مەروەدا بێت و بچێ، جا لەوبارەوە پرسیاریان لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ئێمە لە سەردەمی نەفامییدا پێمان گوناح بوو کە طەوافی صەفاو مەروە بکەین، خواش ئەمەی نارده خوار: ﴿إِنَّ ٱلصَّفَا وَٱلْمَرْوَةَ مِن شَعَآئِرِ ٱللَّهِ ...﴾، ئنجا عائیشە گوتی: دوای ئەوەی کە پێغەمبەری خوا طەوافی کردوون، هیچکە بۆی نیە طەوافیان نەکات.

٢/ هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتە، کە دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكْتُمُونَ مَآ أَنزَلْنَا مِنَ ٱلْبَيِّنَٰتِ وَٱلْهُدَىٰ مِنۢ بَعْدِ مَا بَيَّنَّٰهُ لِلنَّاسِ فِى ٱلْكِتَٰبِ أُو۟لَٰٓئِكَ يَلْعَنُهُمُ ٱللَّهُ وَيَلْعَنُهُمُ

ﭐللَّٰعِنُونَ ﴾، ((نَزَلَتْ في عُلَمَاء أَهْلِ الكِتَاب الَّذِينَ كَتَمُوا آيَة الرَّجمِ وأَمْرَ مُحَمَّدٍ ﷺ))، (أسباب النزول لِلنيسابوري)[1]، واتە: دەربارەی خاوەن کتێبەکان ئەم ئایەتە هاتە خوارێ کە نیشانەکانی پێغەمبەریان ﷺ، دەشاردنەوە، وە ئەو ئایەتەی باسی بەرد بارانکردنی پیاوو ئافرەتی دەکرد شاردبوویانەوە، بەم بۆنەوە خوا پەروەردگار ئەم ئایەتەی نارده خوارەوە (هەڵبەتە دوایی بە فراوانیی باسی ئەم ئایەتە دەکەین).

## مانای گشتی ئایەتەکان

خوا ﷻ بەو بۆنەوە کە پێشتر باسی ڕووگە (قِبْلَة) کرا، باسی صەفاو مەروەش دەکات کە دوو نیشانەو درووشمی خوا پەرستیین لەلای کەعبە، جا بەو بۆنەوە کە هەندێك (وەك دایکمان عائیشە ڕوونی کردۆتەوە) کە خەڵکی مەدینە پێیان وابووە گوناحیان دەگاتێ لەنێوانیاندا بێن و بچن، چونکە کاتی خۆی هەریەکەیان (بت)ێکی لەسەردانرا بوو، بە ناوەکانی: (أَساف) و (نائِلة)، خوا ﷻ ڕوونی کردۆتەوە، کە ﴿ إِنَّ ٱلصَّفَا وَٱلْمَرْوَةَ مِن شَعَآئِرِ ٱللَّهِ ﴾، صەفاو مەروە (ئەو دوو شاخۆلکەیە) لە درووشمەکانی خوان، واتە: لە درووشمەکانی ئایینی خوان ﴿ فَمَنْ حَجَّ ٱلْبَيْتَ أَوِ ٱعْتَمَرَ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِ أَن يَطَّوَّفَ بِهِمَا ﴾، جا هەر کەسێك حەجی ماڵی خوای کرد، یاخود عومرەی کرد، گوناهی ناگاتێ، کە لە بەینیاندا بێت و بچێ، ﴿ وَمَن تَطَوَّعَ خَيْرًا ﴾، هەر کەسێکیش خێرێکی زیادە بکات، واتە: حەجی سوننەت بکات، یان عومرەی سوننەت بکات ﴿ فَإِنَّ ٱللَّهَ شَاكِرٌ عَلِيمٌ ﴾، ئەوە بێگومان خوا سوپاسگوزاری زانایە، شایانی باسیشە لەسەر ڕای هەموو زانایان، حەج واجبە بۆ جاری یەکەم، عومرەش هەندێك دەڵێن: بۆ جاری یەکەم هەر فەرزە، بەڵام هەندێك دەڵێن: سوننەتە، بەڵام بۆ جاری دووەم هەم حەج و

---

١) هەروەها بڕوانە: (الجامع لأحكام القرآن) للقرطبي، ج (٢)، ص (١٦٤)، کە گوتوویەتی (واختلفوا مَنِ المُراد بذلك ؟ فقيل: أحبارُ اليهود والنَّصارى الذين أمر محمدٍ ).

هەم عومرەش سوننەتن، جا دەفەرموێ: کەسێکیش خێری زیادە بکات، ئەوە بێگومان خوا سوپاسگوزاری زانایە، واتە: خوا سوپاسی دەکاتو پاداشتی دەداتەوە بەچاکتر لە کردەوەکەی خۆی، وە خوا زاناشە دەزانێ هەر کەسە بە چ نیەتێك دەیکاتو چۆنی دەکاتو، چەندە ئیخلاصی هەیەو چەندە بە ڕێکیی کردوویەتیو شایستەی پاداشتی چاکەیە، ئنجا دێتە سەر باسی ئەوانەی ئایەتەکانی خوا دەشارنەوەو بەڵگەکانی دینی خواو ڕێنمایی یەکان دینی خوا لە خەڵك دەشارنەوە، دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكۡتُمُونَ مَآ أَنزَلۡنَا مِنَ ٱلۡبَيِّنَٰتِ وَٱلۡهُدَىٰ مِنۢ بَعۡدِ مَا بَيَّنَّٰهُ لِلنَّاسِ فِي ٱلۡكِتَٰبِ ﴾، واتە: بێگومان ئەوانەی کە ئەو بەڵگانە دەشارنەوە وە ئەو ڕێنمایی یە دەشارنەوە، دوای ئەوەی بۆ خەڵکیمان ڕوونکردوونەوە لە کتێبی خۆماندا، (کتێبی خۆمان واتە: قورئانو هەموو ئەو کتێبانەی کە خوا ناردوونی بۆ پێغەمبەرانی دیکەش)، هەندێك گوتوویانە: مەبەست لێرەدا خاوەن کتێبەکانن کە نیشانەکانی پێغەمبەریان دەشاردەوە ﷺ، بەڵام زانایان وەك بنچینەیەك دایانناوە دەڵێن: (العِبرَةُ بِعمُومِ المَعنَى وَلَيسَ بِخصُوصِ السَبَب)، واتە: دەبێ سەرنجی گشتگیریی مانا بدرێ، نەك تایبەتمەندیی هۆی هاتنەخوار، ئەوە بنچینەیە بۆ هەموو ئەو بەسەرهاتانەی باس دەکرێن، وەك هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتەکان، بۆ نموونە: ئایەتێك دەربارەی هاوەڵێك هاتۆتە خوارێ، ئەوە هەر تایبەت نیە بەوەوەو تەماشا ماناکەی دەکرێ بەگشتی، ئەم ئایەتەش ڕەنگە بە پلەی یەکەم ئەوکاتە مەبەست پێی ئەوانەبێ کە نیشانەکانی پێغەمبەر ﷺ دەشارنەوە کە خوا لە کتێبەکانی پێش قورئاندا خستوونیە ڕوو (وەك لە دەرسی ڕابردوودا باسمان کرد کە لە تەوراتو ئینجیلو زەبووردا باسی نیشانەکانی پێغەمبەر ﷺ کراوە)، بەڵام ئێستا تەنیا خاوەن کتێبەکان ناگرێتەوە، بەڵکو زانایانی مسوڵمانانیش دەگرێتەوە، ئەگەر بێتو ئەوەی کە خوا لە قورئاندا ناردوویەتە خوار، لە بەڵگە ڕۆشنەکانو لەو هیدایەتو ڕێنمایی یە کە بۆ خەڵك ناردوویەتی، بیشارنەوە، لە ترسی ستەمکارو زاڵمەکانو پەنهانی بکەن، ئەوە هەر هەمان سزاو هەمان هەڕەشە، کە خوا لە خاوەن کتێبە پێشووەکانی کردوە،

زانایانی مسوڵمانیش دەگرێتەوە، بەڵکو چاکتریش دەیانگرێتەوە، بۆچی؟ چونکە ئۆممەتی پێغەمبەر ﷺ چاکترین ئۆممەتن‌و دەبێ لە خەڵکی چاکتربن‌و، زانایەکانیش دەبێت چاکتربن‌و پابەندتربن لە زانایانی ئۆممەتەکانی دیکە، جا دەفەرموێ: ئەوانەی ئایەتەکانی ئێمە دەشارنەوەو بەڵگە ڕۆشن‌و ڕێنماییەکانی ئێمە دەشارنەوە، دوای ئەوەی بۆ خەڵکیمان ڕوونکردوونەوە لە کتێبی خۆماندا ﴿ أُوْلَـٰٓئِكَ يَلۡعَنُهُمُ ٱللَّهُ وَيَلۡعَنُهُمُ ٱللَّـٰعِنُونَ ﴾، ئا ئەوانە خوا نەفرینیان لێ دەکات، وە هەرچی نەفرینکەرە نەفرینیان لێ دەکات، دیارە هەر نەفرینی خواش بەسەو خوا نەفرین لە هەر شتێك بکات ئەوە دووری دەخاتەوە لە دنیاو قیامەت لە ڕەحمەتی خۆی‌و، لە هەموو بەخششێکی خۆی بێبەشی دەکات، بەڵام خوا ﷻ دەریخستوە کە هەموو دروستکراوەکان لەگەڵ خوای خۆیان‌و بەدیهێنەری خۆیان دان‌و لەگەڵی هاو هەڵوێستن‌و، خوا چی بفەرموێ جێبەجێی دەکەن‌و لێی لانادەن. دوایی خوا ﷻ کەلاوڕۆژنەیەك دەکاتەوە، دەرووییەکی خێردەکاتەوە، بۆ ئەوانەی کە ڕێیان لێ تێکچووەو خۆیان فرۆشتوە لە بەرانبەر تەماعێك‌و، لە بەرانبەر بەرژەوەندییەکدا ئایەتەکانی خوایان شاردۆتەوەو، شەریعەتی خوایان پەنهان کردوەو، ماستاویان بۆ طاغووت‌و زاڵم‌و فیرعەونەکان کردوە، بەڵام دەیانەوێ بگەڕێنەوە، خوای بە بەزەیی پەروەردگار دەرگایان لێدەکاتەوەو دەفەرموێ: ﴿ إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُواْ وَأَصۡلَحُواْ وَبَيَّنُواْ ﴾، جگە لەوانەی کە دەگەڕێنەوەو چاکسازیی دەکەن، ئەگەر تا ئێستا بە هۆی شاردنەوەی ئایەتەکانی خواوە خراپەکارییان کردوە، لەمەودوا چاکسازیی دەکەن، وە ئایەتەکانی خوا ڕووندەکەنەوە ﴿ فَأُوْلَـٰٓئِكَ أَتُوبُ عَلَيۡهِمۡۚ وَأَنَا ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ ﴾، ئا ئەوانە من دەگەڕێمەوە سەریان، واتە: تۆبەیان لێ وەردەگرم‌و قەبووڵیان دەکەمەوە وەك بەندەی خۆم، وە من تۆبە وەرگرێکی زۆر بەخشندەم، بەڕاستی خوا تۆبە وەرگرێکی بەخشندەیە، ئەگەرنا دەبوو هیچ کاتێك لە کەسێك کە خوا بەهرەمەندی کردوە لە هیدایەتی خۆی‌و، شارەزای کردوە لە کتێبی خۆی‌و لە شەریعەتی خۆی‌و، بەرزی کردۆتەوە بەوە کە زانیاریی شەریعەتی خۆی پێداوە، کەچی تەماشا دەکەی بازرگانیی پێدەکات‌و

مامەڵەی پێوە دەکات، دەبوو خوا قەت لێی خۆش نەبێت، بەڵام خوا تۆبە وەرگرێکی بەخشندەیە. ئنجا باسی سەرەنجامی کافرەکان دەکات و، دەفەرموێ:

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَمَاتُواْ وَهُمْ كُفَّارٌ أُوْلَٰٓئِكَ عَلَيْهِمْ لَعْنَةُ ٱللَّهِ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةِ وَٱلنَّاسِ أَجْمَعِينَ ﴾،

بێگومان ئەوانەی بێبڕوان وە دەمرن لە حاڵێكدا كە كافرن، (واتە: بە كافریی دەمرن) ئا ئەوانە نەفرینی خوایان لەسەرەو نەفرینی فریشتەكانیان لەسەرە، وە هی تێكڕای خەڵكیان لەسەرە، وەك گوتم هی تێكڕای خەڵكی ئەگەر لە قیامەتدا، ئەگەرنا لە دنیادا دیارە كە ئیمانداران نەفرین لە كافران دەكەن، بەڵام خۆ كافران بۆخۆیان نەفرین (لَعْنَة) لە خۆیان ناكەن، مەگەر مەبەست پێی ئەوەبێ كە خانەكانی لەشیان و گەردیلەكانی لەشیان ئەوانیش هەر نەفرینیان لێ دەكەن، كە خوا ﷻ لە چەند ئایەتێكدا باسی كردوە: هیچ شتێك نیە كە خوا بە پاك نەگرێ، وە هیچ شتێك نیە كە ستایشی خوا نەكات، وە هیچ شتێك نیە كە بێ فەرمانیی خوا بكات، هەموو دروستكراوەكان بە زمانی حاڵ پەروەردگارێتی خوایان قەبووڵە، وە دیارە بە پێچەوانەش هەر كەسێك پەروەردگارێتی خوای قەبووڵ نەبێ، وە ڕقی خوای هەڵساندبێ، وە خوای تووڕە كردبێ، ئەوانیش دیارە نەفرینیان لێ دەكرێت، جا دەفەرموێ: ﴿ خَٰلِدِينَ فِيهَا لَا يُخَفَّفُ عَنْهُمُ ٱلْعَذَابُ وَلَا هُمْ يُنظَرُونَ ﴾، بە هەمیشەیی تێیدا دەمێننەوە، لە كوێدا؟ لە سیاقی ئایەتەكاندا دیارە كە لە ئاگردا دەمێننەوە، لە دۆزەخدا بە هەمیشەیی و ئازاریان لەسەر سووك ناكرێ، وە نە مۆڵەت دەدرێن و نە دوا دەخرێن، نە چاوەڕوانیان دەكرێ و نە بە چاوی ڕەحم و بەزەییش تەماشایان دەكرێت.

## چەند مەسەلەیەكی گرنگ

**مەسەلەی یەكەم:** چۆنیەتی پەیوەست بوونی ئەم ئایەتە ﴿ إِنَّ ٱلصَّفَا وَٱلْمَرْوَةَ مِن شَعَآئِرِ ٱللَّهِ ﴾، لەگەڵ ئایەتەكانی دوای خۆی و ئایەتەكانی پێش خۆی .. لەوبارەوە دەمەوێ شتێكتان بۆ باس بكەم، جارێ بەنسبەت ئایەتەكانی پێش خۆی

موناسەبەو پەیوەندییان ئاشکرایە، خوا ﷻ لە ئایەتەکانی پێشێدا باسی قیبلەی کرد، صەفاو مەروەش دیارە دوو شاخۆلکەن لە نزیك کەعبەوە، بەو موناسەبەتەوە خوای تاك باسی کردوە، کە ئەوانیش دوو درووشمو نیشانەی شەریعەتی خوان، بەلاّم وەك بنچینەیەکی گشتی من دەمەوێ ئەوە بلێم: کە ئایەتەکانی قورئان هەرچەندە بە دلنیایی یەوە هەموو وەك ئالقەی زنجیر یەکتر دەبەستنەوە، بەلاّم مەرج نیە ڕیزبەندیی بابەتەکانی بەو شێوەیەبێ، بۆ وێنە: ئینسان کتێبێك دەنووسێ، باسی پاكو خاوێنی دەکات لە فەسڵێکدا، دوایی باسی نوێژ دەکات، دوایی باسی زەکات دەکات، دوایی باسی جیهاد دەکات، دوایی باسی مامەڵەو هەڵسوکەوت دەکات ... هتد، بەلاّم خوا ﷻ ئایەتەکانی قورئانی وا دانەناوە، بۆچی؟ لەبەر ئەوەی کە خوا ﷻ زانیویەتی کە ژیانی ئینسان ئاوا نیە، کە ئینسان لە شوێنێك هەر سەرگەرمی پاكو خاوێنی بێو، لە شوێنێك هەر خەریکی نوێژبێو، لە شوێنێك هەر خەریکی جەنگو جیهاد بێ، بەڵکو ژیان تێکەڵە، لە کاتێکدا کە تۆ خواپەرستیی دەکەی، مەسەلەیەکی کۆمەلاّیەتی دێتە پێش، وە لەکاتی یان سەرگەرمی سەردانێکی کۆمەلاّیەتیدا، نوێژ دێتە پێشێو دەبێ نوێژ بکەی، وە ئێستا سەرگەرمی بەڕۆژوو بوونینو خەریکی تەفسیرکردنی قورئانیشینو ئایەتەکانی خوای پەروەردگار شی دەکەینەوە، ڕەنگە هەر دوای ئەوە میوانێکمان بێ بەخێری دێنین، یاخود خەڵکێك دەعوەت دەکەین، کەواتە: ژیان بۆخۆی تێکەڵەو ئەوەنیە نوێژ لەلایەك بێو ئەویدیکە لەلایەك، بەڵکو هەموو شتەکان تێکەڵنو پێکەوەن، بۆیە خوا ﷻ لە قورئانی خۆیدا بابەتەکانی هەموو لێکداوە، چونکە ژیانیش لێکدراوەو لە ڕاستی ژیان بۆ خۆی ئەو پارچە پارچەکردنو بەش بەشکردنەی کە ئێمە بۆ خۆمان دەیکەین بە شێوەی تیۆریی، ژیان بە عەمەلیی وانیە، بەڵکو ژیان بە عەمەلیی ئاوێتەیەو تێکەڵە.

**مەسەلەی دووەم:** خوا ﷻ شاردنەوەی ئایەتەکانی خۆی بە تاوانێکی یەکجار بێڕەزاو ترسناك وەسف دەکات، وە ئەوانەی ئایەتەکانی خوا دەشارنەوەو ئەو بەڵگە ڕوونو ڕێنماییانەی لە قورئاندا بەرجەستە دەبن دەیانشارنەوە،

سزایەکی بۆ دیاری کردوون ئینسان، لە حەژمەتانی بەدەنی موچڕکەی پێدادێ، ئاخر سزا لەوە گەورەتر کە خوا بەو هەموو گەورەیەی خۆی بفەرموێ: من لەعنەت دەکەم لە کەسێك دوای ئەوە بەڵگەکانم بۆ خەڵك ڕوونکردۆتەوە لە کتێبی خۆمدا لێیان پەنهان بکەن‌و لێیان ژێر لێو بخەن، وە لە کەسێك کە ڕێنمایی‌و هیدایەتی خوا بە خەڵکی ڕانەگەیەنێ، هەرچەندە دەشزانێ خواش ڕوونی کردۆتەوە لە کتێبی خۆیدا، سزا لەوە گەورەتر کە خوای زاناو توانا لەعنەتی لێبکات‌و فریشتەکان لەعنەتی لێ بکەن‌و هەرچی لەعنەتکەرە لەعنەتی لێبکات؟! بەڕاستی سزا لەوە سەختتر نابێ، چونکە گوناحیش لەوە گەورەتر نیە.

دیارە هەربۆیەش (أبو هريرة) خوا لێی ڕازی بێ لەوبارەوە گوتوویەتی: {لولا آيتان أنزلهما الله في كتابه ما حدّثتُ شيئاً أبداً: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكۡتُمُونَ ...﴿١٥٩﴾﴾ البقرة، وقوله ﴿وَإِذۡ أَخَذَ ٱللَّهُ مِيثَٰقَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ لَتُبَيِّنُنَّهُۥ لِلنَّاسِ وَلَا تَكۡتُمُونَهُۥ ...﴿١٨٧﴾﴾ آل عمران} رواه البخاري: (٧٣٥٤)، ومسلم: (٢٤٩٢)، وأحمد والترمذي وإبن ماجة.

**مەسەلەی سێیەم:** خوا ﷻ باسی تۆبەکردنی ئەوانە دەکات کە تا ئێستا ئایەتەکانی خوایان شاردۆتەوە، سێ شتیان بۆ دادەنێ:

یەکەم: ﴿إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُواْ﴾، دەبێ بگەڕێنەوە بۆ لای خوا کە تا ئێستا لە خوا دووربوون بێنەوە بۆ لای خوا، ئەسڵی وشەی (تَوبَة) واتە: (رجُوع)، (تَابَ) واتە: (رَجَعَ) گەڕایەوە تا ئێستا سەرەڕۆیی کردوەو بەولایدا ڕۆیشتوە، بە دوای طاغووت‌و فیرعەونەکاندا ڕۆیشتوەو دینی خۆی بەوان فرۆشتوە، بەڵام لەمەولا بگەڕێتەوە بۆلای خوا.

دووەم: ﴿وَأَصۡلَحُواْ﴾، تا ئێستا چەندەی تاوان کردوە بەهۆی شاردنەوەی ئایەتەکانی خواو پەنهان کردنیانەوە، لەمەو دوا چاکسازیی بکات‌و چەند

کەسی تێکداون، بێنێ ڕاستیان بکاتەوەو چەند کەسی سەر لێشێواندوون، بێنێ بۆیان ڕۆشن بکاتەوە.

سێیەم: ﴿ وَبَيَّنُواْ ﴾، ئنجا ئایەتەکان کە تا ئێستا شاردوونیەوەو ژێر لێوی خستوون، بێنێ ڕوونیان بکاتەوە، ئا ئەوانە شایستەی ئەوە دەبن بە ڕەحمو بەزەیی خواو، بێگومان خوا تۆبە وەرگرێکی بەخشندەیە.

**مەسەلەی چوارەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَمَاتُواْ وَهُمْ كُفَّارٌ أُوْلَٰٓئِكَ عَلَيْهِمْ لَعْنَةُ ٱللَّهِ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةِ وَٱلنَّاسِ أَجْمَعِينَ ﴾ ، ئەوانەی کافر بوونو بە کافرایەتییش مردوون، نەفرینی خواو فریشتەکانو تێکڕای خەڵکیان لەسەرە، ئەمە دوو لێکدانەوەی هەیە، چونکە یەکێ بۆی هەیە بڵێ: خۆ کافرەکان لەعنەت لە خۆیان ناکەن؟! بۆچی تەنیا نەیفەرمووە: لەعنەتی ئیماندارانیان لەسەرە؟ ئەوە دوو لێکدانەوەی هەیە:

**یەکەم:** دەگونجێ مەبەست پێی قیامەت بێ، واتە: لە قیامەتێ خوا نەفرینیان لێدەکاتو، فریشتەکان نەفرینیان لێ دەکەنو، بۆخۆشیان نەفرین لە خۆیان دەکەن، لەخۆیان بێزار دەبن.

**دووەم:** واتایەکی دیکەی ئەوەیە کە گەردیلەکانی کە جەستەیان لێیان پێکهاتوە، وە خانەکانی کە لەشیان لێیان پێکهاتوە، نەفرینیان لێبکەن، بەپێی سیاقی ئەو ئایەتانەی کە خوا ﷻ دەیخاتەڕوو: هیچ شتێك نیە لە بوونەوەردا خوا بە پاكو بە دوور نەگرێ، لە هەموو عەیبو کەموکووڕییەك، وە هیچ شتێك نیە کە ملکەچی نەبێت.

**مەسەلەی پێنجەم:** ئەوەیە کە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿لَا يُخَفَّفُ عَنْهُمُ ٱلْعَذَابُ وَلَا هُمْ يُنظَرُونَ ﴾ ، بێبڕوایان لە دۆزەخ دا ئازاریان لەسەر سووك ناکرێو چاوەڕوانییشیان ناکرێ، لێرەدا مەبەستم ئەم ڕستەیەیە: (ئازاریان لەسەر سووك ناکرێ)، هەندێك لە توێژەرەوانی قورئان دەڵێن: کاتێك کە ئینسان زۆر لە دۆزەخدا دەمێنێتەوە، پێوەی ڕادێ، واتە: ئەو ئازارو ئەشکەنجەیەی لەلا

دەبێتە شتێکی ئاسایی‌و وردە وردە ئازارەکەی کەم دەبێت !! بەڵام خوا ﷻ لە سووڕەتی (النساء)دا ئەو گرێ کوێرەیەمان بۆ دەکاتەوە، کە دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بِـَٔايَـٰتِنَا سَوْفَ نُصْلِيهِمْ نَارًا كُلَّمَا نَضِجَتْ جُلُودُهُم بَدَّلْنَـٰهُمْ جُلُودًا غَيْرَهَا لِيَذُوقُوا۟ ٱلْعَذَابَ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَزِيزًا حَكِيمًا ﴿٥٦﴾ ﴾، واتە: بێگومان ئەوانەی بێبڕوان بە ئایەتەکانی ئێمە، لەمەودوا دەیانخەینە نێو ئاگرێکەوە، هەرکات پێستەکانیان کوڵی (واتە: پێستیان برژاو داماڵرا) پێستی دیکەیان بەبەردا دەکەین، بۆ ئەوەی کە بەردەوام ئەو ئازارە بچێژن.

دیارە ئەمیش ئیعجازێکی عیلمیی تێدایە، چونکە ئەو دەمارانەی کە هەست بە ساردیی‌و گەرمیی دەکەن لە پێست دان، جا کاتێك کە پێست دەسووتێ، ئینسان زۆر هەست بە ئازاری سووتانەکە ناکات، بۆیە خوای کاربەجێ پێستەکەیان بۆ نوێ دەکاتەوە، بەو پێیە هەرکاتێك کە پێستەکانیان سووتا، خوا ﷻ پێستی دیکەیان بەبەردا دەکات‌و بۆیان دروست دەکات کە ئێمە نازانین ئەوە چۆنە؟ بۆ ئەوەی کە بەردەوام وەك یەکەمجار ئەو ئازاروئێشە بچێژن، کە لە دۆزەخدا بۆیان دانراوە.

**مەسەلەی شەشەم:** زانایان دەربارەی حوکمی نەفرین کردن (لَعْنَة) لە هەرشتێك، باسیان کردووەو هەموویان لەسەر ئەوە یەك دەنگن کە دروستە بەگشتی نەفرین لە کافران بکرێت، هەروەك خوا ﷻ فەرموویەتی نەفرین لە کافران، ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَعَنَ ٱلْكَـٰفِرِينَ وَأَعَدَّ لَهُمْ سَعِيرًا ﴿٦٤﴾ ﴾ الأحزاب، وە فەرموویەتی نەفرین لە زاڵمان: ﴿ ...أَلَا لَعْنَةُ ٱللَّهِ عَلَى ٱلظَّـٰلِمِينَ ﴿١٨﴾ ﴾ هود، بەڵام ئایا بۆ کافرێکی دیاریکراو دروستە یان نا ؟ زانایان لێرەدا ڕاجیاییان هەیە، وە زۆربەیان بەدروستی نازانن‌و هەندێکیشیان بە دروستی دەزانن، بەڵام من پێم وایە بۆ کافرێکی دیاریکراو کە جارێ لە ژیان دایە، دروست نیە، یان بەلای کەمەوە پەسند نیە نەفرین‌و لەعنەتی لێ بکرێ، چونکە نازانین سەرەنجام‌و کۆتاییەکەی چۆن دەبێت، وە بەڕاستیش ئەدەبێکی ئیسلامییە کە ئینسان بەپێی

توانا خۆی لە بەکارهێنانی وشەی لەعنەت بپارێزێ، چونکە ئەگەر ئێمە تەنانەت یەکجار لەعنەت لە (ئیبلیس)یش نەکەین، خوا ﷻ موحاسەبەمان ناکات، مەگەر ئەوەی لە ئایەتەکاندا خوا فەرموویەتی، بەڵام ئەگەر نەفرین کردنەکە لە شوێنی خۆیدا نەبێ، ئەوە گوناحێکی زۆر گەورەیە، هەتا لە فەرمایشتی پێغەمبەردا هاتوە ﷺ: کاتێك کە یەکێك لەعنەت لە شتێك دەکات، ئەو لەعنەتە دەگەڕێ لە ئاسمان‌و لە زەویدا، ئەگەر ئەو شتەی، یان ئەو کەسەی کە نەفرینەکەی بۆ نێردراوە، شایستەی ئەو نەفرینە نەبوو، ئەوا دەگەڕێتەوە بۆ خاوەنەکەی، کەواتە: پێویستە ئینسان زۆر خۆی بپارێزێ لە بەکارهێنانی وشەی لەعنەت پێغەمبەر ﷺ لەوبارەوە فەرموویەتی: {(لاَ يَرْمِ رَجُلٌ رَجُلاً بِالْفِسْقِ وَلاَ يَرْمِهِ بِالْكُفْرِ إِلاَّ ارْتَدَّتْ عَلَيْهِ إِنْ لَمْ يَكُنْ صَاحِبُهُ كَذَلِكَ) (رَوَاهُ أَحْمَد برقم: (٢١٤٦٣)، وَالبُخَارِيُّ برقم: (٦٠٤٥)، عَنْ أَبِي ذَرٍّ رضي الله عنه}، واتە: هیچ پیاوێك وشەی (فاسق) بۆ پیاوێکی دیکە بەکارناهێنێ، وە وشەی (کافر)ی بۆ بەکارناهێنێ، مەگەر بخۆی دەگەڕێتەوە، ئەگەر خاوەنەکەی وانەبێ.

**مەسەلەی حەوتەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَمَاتُواْ وَهُمْ كُفَّارٌ أُوْلَٰٓئِكَ عَلَيْهِمْ لَعْنَةُ ٱللَّهِ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةِ وَٱلنَّاسِ أَجْمَعِينَ ﴾، یان لە ئایەتەکەی پێشیدا کە فەرمووی: ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ يَلْعَنُهُمُ ٱللَّهُ وَيَلْعَنُهُمُ ٱللَّٰعِنُونَ ﴾، بۆیە خوا ﷻ وە هەموو لەعنەتکەرەکان لەعنەت دەکەن لە ئینسانی کافر، لەوانەی کە ئایەتەکانی خوا بەنرخێکی کەم دەفرۆشن، وە دەیانشارنەوە وە دەیانگۆڕن، چونکە ئەوە دەبێتە هۆی چەواشەکردنی خەڵك‌و لەڕاستیدا کوفری ئینسانی زانا‌و شاردنەوەی ئەو بەڵگە ڕۆشنانەی کە خوا ناردوونیە خوار لە کتێبەکانیدا، وە شاردنەوەی ڕێنموونیی‌و هیدایەتی خوا، دەبێتە هۆی زەرەرو زیانێك کە هەموو دروستکراوەکان لێی زەرەرمەند دەبن، وەك خوا ﷻ باسی کردوە، بۆ وێنە: لە سووڕەتی (الروم)دا دەفەرموێ: ﴿ ظَهَرَ ٱلْفَسَادُ فِى ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ بِمَا كَسَبَتْ أَيْدِى ٱلنَّاسِ ... ﴿٤١﴾ ﴾ الروم، واتە: خراپەو ئاشووب تەڕو وشکی گرتەوە بەهۆی

کردەوەی خەڵکی، وە لە فەرمایشتەکانی پێغەمبەردا ﷺ هاتوە کە کاتێك گوناح دەکرێ، ئەو گوناحو تاوانە کاریگەریی سەلبیی هەیە بۆ سەر هەموو زیندەوەران، بەڵکو بۆ ئەو دەوروبەرە هەمووی، وە بە پێچەوانەوە کاتێك کە طاعەتێك دەکرێ، دروستکراوەکان هەموویان تەفاعولی ئیجابییان دەبێ لەگەڵ خاوەنی ئەو طاعەتەداو، لەگەڵ ئەو چاکەیەدا، بۆیە خوا ﷻ نەفرینەکەی گشتگیر کردوەو ڕایگەیاندوە کە هەموو دروستکراوەکانی خوا، نەفرین لە ئینسانی بێبڕوا دەکەن، وە لە کەسانێك کە ئایەتەکانی خوا ئەو دەستوورو یاسایانەی کە خوا ناردوونی لە کتێبەکەی خۆیداو ڕوونی کردوونەوە، دەشارنەوە، چونکە هەموو دروستکراوەکانی خوا زەرەرمەند دەبن، بەهۆی بڵاوبوونەوەی کوفرو شاردنەوەی هەقەوە.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی سی و سێیەم

## پێناسـەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسە لە ئایەتی ژمارە (١٦٣ تاکو ١٦٧) دەگرێتە خۆی، واتە پێنج (٥) ئایەت، لەم پێنج ئایەتەدا خوا ﷻ سەرەتا باسی یەکتایی خۆی دەکات، پاشان باسی بەڵگەو نیشانەکانی پەروەردگاریێتی خۆی دەکاتو دە (١٠) نیشانەو بەڵگە دەخاتە ڕوو، دوایی باسی هەڵوێستی هاوبەش بۆ خوا دانەران و بێ بڕوایان دەکات، کە چۆن لەگەڵ خوا یان لەجیاتی خوا، هەندێ شتی دیکە دەپەرستن و وەك خوا خۆشیان دەوێن و بەندایەتییان بۆ دەکەن، دوایی باسی سەرەنجامی ئەوانە دەکات کە پەیڕەوییان لێدەکرێت، هەروەها ئەوانەی کە شوێنیان دەکەون، وە بۆیان دەبنە دارو دەستەو بۆیان دەبنە دەستو پێ.

﴿ وَإِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَاحِدٌ ۖ لَّا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ الرَّحْمَٰنُ الرَّحِيمُ ﴿١٦٣﴾ إِنَّ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَاخْتِلَافِ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ وَالْفُلْكِ الَّتِي تَجْرِي فِي الْبَحْرِ بِمَا يَنفَعُ النَّاسَ وَمَا أَنزَلَ اللَّهُ مِنَ السَّمَاءِ مِن مَّاءٍ فَأَحْيَا بِهِ الْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا وَبَثَّ فِيهَا مِن كُلِّ دَابَّةٍ وَتَصْرِيفِ الرِّيَاحِ وَالسَّحَابِ الْمُسَخَّرِ بَيْنَ السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَعْقِلُونَ ﴿١٦٤﴾ وَمِنَ النَّاسِ مَن يَتَّخِذُ مِن دُونِ اللَّهِ أَندَادًا يُحِبُّونَهُمْ كَحُبِّ اللَّهِ ۖ وَالَّذِينَ آمَنُوا أَشَدُّ حُبًّا لِّلَّهِ ۗ وَلَوْ يَرَى الَّذِينَ ظَلَمُوا إِذْ يَرَوْنَ الْعَذَابَ أَنَّ الْقُوَّةَ لِلَّهِ جَمِيعًا وَأَنَّ اللَّهَ شَدِيدُ الْعَذَابِ ﴿١٦٥﴾ إِذْ تَبَرَّأَ الَّذِينَ اتُّبِعُوا مِنَ الَّذِينَ اتَّبَعُوا وَرَأَوُا الْعَذَابَ وَتَقَطَّعَتْ بِهِمُ الْأَسْبَابُ ﴿١٦٦﴾ وَقَالَ الَّذِينَ اتَّبَعُوا لَوْ أَنَّ لَنَا كَرَّةً فَنَتَبَرَّأَ مِنْهُمْ كَمَا تَبَرَّءُوا مِنَّا ۗ كَذَٰلِكَ يُرِيهِمُ اللَّهُ أَعْمَالَهُمْ حَسَرَاتٍ عَلَيْهِمْ ۖ وَمَا هُم بِخَارِجِينَ مِنَ النَّارِ ﴿١٦٧﴾ ﴾

## مانـــای وشـــه بـه وشـــەی ئایەتەکـــان

((وە پەرستراوتان یەك پەرستراوە، جگە لەو هیچ پەرستراونین، بە بەزەیی بەخشندەیە ﴿١٦٣﴾ بەڕاستی لە دروستکرانی ئاسمانەکانو زەویو جێگۆڕکەی شەوو ڕۆژان داو، ئەو کەشتیانەدا کە بە جۆرێ سوود بەخەڵکی دەگەیەنێ، لە دەریادا دەڕۆن، وە ئەو ئاوەی خوا لە ئاسمانەوە ناردوویەتە خوارێ، وە پاش مردن زەوی پێ زیندوو کردۆتەوەو لە هەرجۆرە زیندەوەرێکی تێدا بڵاوکردۆتەوە، وە جۆراو جۆرکردنی بایەکانو ئەو هەورەی کە لەنێوان ئاسمانو زەویدا ڕامکراوە، نیشانە هەن بۆ کەسانێك کە بفامن ﴿١٦٤﴾ وە کەسانێك لە خەڵکی هەن، کە جگە لە خوا هاوتایانێك دەگرن، وەك خۆشویستنی خوا خۆشیان دەوێن، بەڵام ئەوانەی ئیمانیان هێناوە خۆشەویستییان بۆ خوا توندترە، وە ئەگەر ئەوانەی ستەمیان کردوە، دەیانبینی کاتێك کە ئازاری دۆزەخ دەبینن، کە هێز هەمووی هی خوایەو ئازاری توندی هەیە {بۆ ستەمکاران، بێگومان زۆر پەشێمان دەبنەوە} ﴿١٦٥﴾ کاتێك کە پەیڕەویی لێکراوەکان حاشا لە شوێنکەوتووەکانیان دەکەنو ئازار دەبینن، وە پەیوەندییەکانیان لەنێواندا دەپچڕێت ﴿١٦٦﴾ وە ئەوانەی شوێنکەوتوو بوون دەڵێن: خۆزگە ئێمەش نۆرەیەکمان هەبووایە (واتە: ئێمە بووباین بە سەرکردەو ئەوان شوێنکەوتوو) کە حاشایان لێ بکەین، وەك چۆن ئەوان حاشایان لێکردین، وە ئاوا خوا کردەوەکانیان پێشان دەدات کە مایەی غەمو پەژارەیانە، وە لە ئاگریش دەرباز نابن ﴿١٦٧﴾)).

## شیکردنەوەی هەندێك لە وشەکان

**(إِلَٰهَ)**: ﴿ وَإِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَاحِدٌ لَّا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ الرَّحْمَٰنُ الرَّحِيمُ ﴾، خوا ﷻ لەم ڕستەیەدا سێ جار وشەی (إِلَٰهَ)ی دووبارە کردۆتەوە، (إِلَٰهَ) (إِسمٌ لِكُلِّ مَعبُودٍ) ناوە بۆ هەر پەرستراوێك، چ بە هەق بپەرسترێ کە تەنیا خوایە، چ بە ناهەق

بپەرستــرێ کــە هــەموو ئــەو شــتانەن کــە لــەجیاتی خــوا یــان لەگــەڵ خــوادا دەپەرستــرێن، هــەر لــە دارو بــەردو گیاوگــوڵو مــشكو مــارەوە بگــرە، هــەتا خڕۆکــەو مــانگو ئەســتێرەکــان، هــەواو ئــارەزوو، پــارەو پــوولو ســامان، طــاغووتەکانو هــەر شــتێکی دیکــە کــە لــەجێی خــوا دەپەرستــرێو، وەك خــوا خۆشدەویسترێو بەگەورە دەگیرێو ملی بۆ کەچ دەکرێ، وە وشەی (إِلَٰهٌ) لـە (أَلِـه فُـلانٌ يَأْلَـهُ إِلاهَـةً: أي عَبَـدَ يَعبـدُ عِبـادَةً) لـەوەوە هـاتوە، واتــە: پەرســتی، دەپەرستێ، پەرستن، (إلاهـةً يَعـني عِبَـادَةً) یـان لـە (أَلَـهَ)ەوە هـاتوە، بـە مانـای (تَحيَّـر) ســەرسام بــوو، یــاخود لــە (لاهَ يَلُـوهُ لِيَـاهًـا)ەوە، هــاتوە، بــە واتــای (احتَجب)، پەنهـان بوو، چونکە خـوا ﷻ پەنهانە.

(**وَٱخۡتِلَٰفِ**): واتە: جیــاوازیی، بــەڵام لێــرەدا بــەواتای جێــی یەکــدی گرتنەوەیــە، یــان جێگۆڕکــە، جێگــۆڕکەی شــەوو ڕۆژ، وە دەشــگونجێ بــە واتــای جیــاوازییش بــێ، چــونکە ڕۆژ لــە شــەو جیــایەو شــەویش لــە ڕۆژ جیایــە، (اختِـلافِ اللّيـل والنّهارِ: أي مجِيءِ كُلٍّ وَاحِدٍ مِنهُمَا خَلْفَ الآخَرِ وتَعَاقُبِهما) هەرکامێکـیان بەدوای ئەوی دیکــەدا دێ.

(**وَٱلۡفُلۡكِ**): لێرەدا بەواتای کۆی کەشتییەکانە، چونکە وشەی (فُـلْـك) لە قورئانـدا بەمانای یەك کەشتی دێت، وە بـە مانـای (کـۆ)ش دێ، کەشـتییەکان، بـۆ وێنـە: لێـرە دەفـەرموێ: ﴿وَٱلۡفُلۡكِ ٱلَّتِي تَجۡرِي﴾، خـوا بـە مێینـە (مُؤَنَّث)ی هێنـاوە چونکە کۆیە، واتە کەشتییەکان، بـەڵام لـە شـوێنی دیکـەدا خـوا ﷻ (فُـلْـك)ی هێناوە بەتــاك، بۆیە ڕانـاوی نێرینــە (مُذَكَّر)ی بـۆ بـەکارهێناوە، (الفُـلْـكُ: الـسَّفِينَةُ ويُـستعْمَلُ ذَلِـكَ لِلمُفْـرَدِ والجَمْـعِ، والفُلْـكُ مَجْـرَى الكَوَاكِـبِ)، (فُلْـك): ئەو ســووڕگەیەیە کـە خڕۆکـەکان تێیـدا دەســووڕێنەوە، وە (فُلْـك): هەم بەواتــای یەك کەشتی دێ، هەم بەواتــای کۆمەڵە کەشــتییەکیش دێ، ئێمـە بەپێی سیاقی ئایەتەکان بۆمان دەردەکەوێ کە مەبەستی تاکە یاخود کۆیــە.

(**وَبَثَّ**): (أَصْلُ البَثِّ: التَفْرِيق وإثَارَةُ الشَّيءِ كَبَثِّ الرِّيحِ التُّرَاب، وبَثُّ النَّفْسِ مَا انطوت عَلَيهِ مِن الغَمّ) ئەسڵی وشەی (بَث) واتە: لێك بڵاوكردنو هەڵستاندنی شتێك لە شوێنی خۆی، وەك چۆن با گڵو تۆزو خۆڵ هەڵدەستێنێ، یاخود ئینسان ئەو غەمەی كە لە دڵی دایە بڵاوی دەكاتەوە بۆ كەسێكی باس دەكات.

(**دَآبَّةٍ**): (الدَّبُّ والدَّبِيبُ: مَشِيٌ خَفِيف) واتە: ڕۆیشتنێكی لەسەرەخۆ (ولَفظُ الدَّابَة يُستعْمَلُ فِي كُلِّ حَيوَانٍ) وشەی (الدَّابَة) بەكاردێت بۆ هەر زیندەوەرێك و بۆ هەر شتێك كە لەسەر زەوی بڕوا جا ئینسان بێ، زیندەوەر بێ، ئاژەڵ بێ، هەرچی بێ.

(**وَتَصْرِيفِ ٱلرِّيَٰحِ**): واتە: جۆراو جۆركردنی بایەكان، هەرجارە لە شوێنێكەوە هەڵدەكەن، هەندێكیان نەرمنو هەندێكیان توندن، هەندێكیان هەور دێنن، هەندێكیان گژوگیاو دارەكان موتووربە دەكەن. (الصَّرْفُ: رَدُّ الشَّيءِ مِنْ حَالَةٍ إلى حَالَةٍ، أوْ إبدَالُهُ بِغَيرِهِ)، واتە: (صَرْفُ) ئەوەیە كە شتێك لە حاڵێكەوە بۆ حاڵێك بگۆڕێ، یاخود بیگۆڕێ بە شتێكی دیكە، (يُقَالُ صَرَّفتُهُ فانصَرَفَ) گۆڕیمو ئەویش لاچوو، (والتَّصرِيفُ: كَالصَّرْفِ إلاَّ في التَّكثِيرِ) (التَّصرِيفُ): ئەویش هەر بە مانای گۆڕینە،بەڵام مانای زیاتر دەگەیەنێو زێدەڕۆیی تێدایە.

(**ٱلرِّيَٰحِ**): كۆی (رِيحَ)ە، (رِيَاح) واتە: بایەكان (وهُوَ الهَوَاءُ المُتَحَرِّك، المُفرَد لِلْعَذَابِ والجَمع لِلرَّحمَة) هەوا كە دەجوولێ پێی دەگوترێ (رِيح)، ئنجا لە قورئاندا وشەی (رِيح)، ئەگەر بە تاك هاتبێ بە زۆری بۆ ئازارو سزایە كە خوا دەینێرێ، بەڵام كە بە كۆ بەكاردێ، مەگەر چۆن دەنا هەر ڕەحمەتو بەرەكەتە ﴿ وَأَرْسَلْنَا ٱلرِّيَٰحَ لَوَٰقِحَ ...﴿٢٢﴾ ﴾الحجر، واتە: بایەكانمان ناردوە گژوگیا موتووربە دەكەن، هەوران موتووربە دەكەن، یان كە دەفەرموێ: ﴿ وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦٓ أَن يُرْسِلَ ٱلرِّيَاحَ مُبَشِّرَٰتٍ ﴿٤٦﴾ ﴾الروم، واتە: وە لە نیشانەكانی ئەوەیە كە بایە موژدەدەرەكان دەنێرێ.

(وَٱلسَّحَابِ)؛ واتـــە: هـەور.

(ٱلْمُسَخَّرِ)؛ (التَّسْخِيرُ: سوقُهُ إلى الغَرَضِ المُخْتَصِّ بِهِ قَهْرًا)، واتە: شتێك لێ بخوڕی بەرەو مەبەستێك كە تایبەت بێ پێیەوە، بەڵام بە زۆر، (فَالمُسَخَّرُ هُوَ المُقَيَّضُ لِلفعل) (مُسَخَّر): شتێكە ئامادەكراوە بۆ كارێك، وەك خوا ﷻ لە باسی سواربوونی وڵاخدا دەفەرموێ: ﴿... سُبْحَٰنَ ٱلَّذِى سَخَّرَ لَنَا هَٰذَا وَمَا كُنَّا لَهُۥ مُقْرِنِينَ ﴿١٣﴾﴾الزخرف، واتـە: پاكیی بۆ ئـەو پەروەردگـارەی كـە ئەمەی (واتە: ئـەو ئـاژەڵـەی) بۆ دەستەمۆو ڕامكردووین كـە ئێمـە توانامـان بەسەریدا نەدەشكا، ئەگەر خوا بۆی دەستەمۆ نەكردبـاین.

(أَندَادًا)؛ كۆی (نِدّ)ە، (نِدُّ الشَّيء: مُشَارِكهُ في جَوهَرِهِ، فَالمِثلُ كُلُّ مُشَارِك، فَكُلُّ نِدٍّ مِثلٌ وَلَيسَ العَكس)، (نِدّ) واتە: شتێك كە وەك شتێك بێ، بەڵام لە جەوهەرو نێوەڕۆكدا وەك ئەوبێ، واتـە: (نِدّ)و (مِثْل) مانایان لێك نزیكە، وەك یەكبوونی دووشت، بـەڵام (نِدّ) زیـاتر مانـای هـاوكوفیی‌و هاوتـایی دەگەیەنێ، بۆیە هەموو (مِثْل)ێك (نِدّ)ە، بەڵام بە پێچەوانەوە نـا.

(تَبَرَّأَ)؛ واتـە: حاشای كـرد، (أَصْلُ البُرْءِ والبَرَاءَةُ والتَّبَرِّي: التَّقَصِّي مِمَا يكرَهُ مُجَاوَرَتَهُ) ئەسـڵی وشـەی (البُرْءِ والبَرَاءَةُ والتَّبَرِّي) بریتیـە لـە خـۆ دووركرتن لە شتێك كە پێت ناخۆش بێ لێت نزیك بێ (هـاوسێیەتیی ئـەوت پێ ناخۆش بێ) وەك خـوای پەروەردگـار دەفەرموێ: ﴿بَرَآءَةٌ مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦٓ إِلَى ٱلَّذِينَ عَٰهَدتُّم مِّنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿١﴾﴾التوبة، واتـە: (ئەمـە) دووریـی گرتنـە لـە خـواو لـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ (حاشـاكردنە) بـۆ ئـەو هاوبـەش بـۆ خـوا دانەرانەی كە پەیمانتـان لەگەڵیـاندا هەیە (وە پابەندنین بە پەیمانەكەوە).

(ٱلْأَسْبَابُ)؛ كۆی (سَبَب)ە، (سَبَب) واتە: هۆ (والسَّبَبُ: هُوَ الحَبْلُ الَّذي يُصْعَدُ بِهِ النَّخلَ). (سَّبَب): لە ئەسڵی زمانـدا بریتیـە لەو گوریسـە یـان لـەو پەتـەی

کە پێی سەردەکەوێ بۆ دارخورما (وَسُمِّيَ كُلُّ مَا يُتَوَصَّلُ بِهِ إِلَى شَيْءٍ سَبَبًا) هەر شتێك کە پێی بگەیە شتێکی دیکە، پێی گوتراوە (سَبَب).

**(كَرَّةً)**: واتە: (رَجعَةً)، نۆرە، گەڕانەوەیەك (الكَرُّ: العَطْفُ عَلَى الشَّيْءِ بِالذَّاتِ أو بِالفِعْلِ)، (كَرّ) واتە: گەڕانەوە سەر شتێك وەك خودی ئەو شتە یاخود وەك ئەو کردەوە.

**(حَسَرَاتٍ)**: کۆی (حَسرة)ەو (حَسرة)یش، واتە: غەمو پەژارەیەکی زۆر، ئەویش لە چییەوە هاتوە؟ (الحَسر: كَشْفُ المَلْبَس عَمَّا عَلَيهِ) پۆشاك ئەوەی کە لەسەریەتی هەڵی دەیەوە، پێی دەگوترێ: (حَسر)، دەگوترێ: (حَسرتُ عَنِ الذراعِ) واتە: قۆڵم هەڵکردوە، باسکم هەڵکردوە، بۆیەش غەمو پەژارە وشەی (حَسرة)ی بۆ بەکارهاتوە، وەك بڵێی ئەو ئینسانە توانای نامێنێتو توناکەی هەمموو دەڕوات.

## هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتەکان

هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتەی کە دەفەرموێ: ﴿إِنَّ فِى خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱخْتِلَٰفِ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ ...﴾ {أُنزِلَتْ بِالمَدِينَةِ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ ﴿وَإِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَٰحِدٌ ۖ لَّآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلرَّحْمَٰنُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١٦٣﴾﴾ البقرة، فَقَالَتْ: كُفَّارُ قُرَيْشٍ بِمَكَّةِ: كَيْفَ يَسَعُ النَّاسَ إِلَهٌ وَاحِدٌ؟ فَأَنزَلَ اللهُ تَعَالَى: ﴿إِنَّ فِى خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱخْتِلَٰفِ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ ...﴾}، (أسباب النزول للنيسابوري)، ص: (٣٢)، واتە: پێغەمبەر ﷺ لە مەدینە ئەم ئایەتەی بۆ هاتە خوار ﴿وَإِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَٰحِدٌ﴾، واتە ئایەتی پێش ئەو ئایەتەی کە باسی خوای پەروەردگار دەکات، کافرە قوڕەیشییەکانی مەککە گوتیان: جا یەك پەرستراو چۆن دەفریای ئەو هەمموو خەڵکەی دەکەوێ، وەڵامی هەمموان بداتەوە کێشەی هەمموان چارەسەر

بكات؟ خوا ﷻ ئەو ئایەتەی دوایی ناردە خوارێ، كە باسی پەروەردگارێتی خۆی دەكات كە چەندە دەسەڵاتی فراوانەو، چۆن فریای هەموو مەخلووقات دەكەوێ.

وە (الواحدي)[1]یش دەڵێ: {لَمَّا نَزَلَتْ هَـذِهِ الآيَة ﴿ وَإِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَاحِدٌ ﴾، تَعَجَّبَ الـمُشرِكُونَ وقَالوا إِلَهٌ وَاحِدٌ ؟ إنْ كَانَ صَادِقاً فَليَأتِنَا بآيةٍ، فَأَنزَلَ اللهُ تَعَالَى: ﴿إِنَّ فِي خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱخْتِلَٰفِ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ ...﴾ إلى آخرِ الآيَة}، واتە: كاتێك ئەم ئایەتە هاتە خوار ﴿ وَإِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَاحِدٌ ﴾ هاوبەش بۆ خوا دانەرەكان بە سەرسوڕمانەوە گوتیان: یەك پەرستراو ! ئەگەر ڕاست دەكات (واتە: موحەممەد) تەنیا یەك پەرستراو هەیە{و ئەو بتو صەنەمانەی ئێمە دەیانپەرستین هیچیان پەرستراو نین}، با نیشانەو بەڵگەیەكمان بۆ بێنێ، خوای بەرزیش ئەم ئایەتەی ناردە خوارێ {كە باسی پەروەردگارێتی خۆی دەكات}.

## مانای گشتی ئایەتەكان

خوا ﷻ باسی یەكتایی خۆی دەكات، باسی تەنیا پەرستراویی خۆی دەكات، پاشان باسی تەنیا پەروەردگارێتی خۆی دەكات، وە باسی هەڵوێستی ئیمانداران لە بەرانبەر یەكتایی خۆیو لە بەرانبەر پەرستراوێتیو پەروەردگارێتی خۆیدا دەكات، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ، كە مەسەلەی یەكتایی خوا تایبەت نەبووە بە قۆناغی مەككەوە، بەڵێ لە قۆناغی مەككەدا زۆر جەختی لەسەركراوەو زۆر داكۆكیی لەسەركراوە، بەڵام لەڕاستیدا مەسەلەی یەكتایی خوا ﷻ، بەتایبەت كە نێوەڕۆكی ئیمانو عەقیدە پێكدێنی، وە مەسەلەی ئیمانو عەقیدە بەگشتی، لەبەر ئەوەی بناغەی مسوڵمانەتیو دینداریيە، وەك چۆن لە قۆناغی مەككەدا زۆر جەختی لەسەر كراوەو زۆر باسكراوە، بەهەمان شێوە لە قۆناغی مەدینەشدا زۆر باسكراوەو بیر مسوڵمانان خراوەتەوە، خوا دەفەرموێ: ﴿ وَإِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ

---

١) (أسباب النزول) للواحدي، ص (٢٥، ٢٦).

﴿وَاحِدٌ﴾، پەرستراوی ئێوە یەك پەرستراوە، ﴿لَّآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ﴾، جگە لەو هیچ پەرستراوی دیکە نین ﴿ٱلرَّحۡمَٰنُ ٱلرَّحِيمُ﴾، بە بەزەیی بەخشندەیە، لێرەدا دەمەوێ شتێك بڵێم[1] کە بە داخەوە زۆر لە وتاربێژەکان تێیدا بەهەڵەدا چوون، ئەویش ئەوەیە کە وشەی (ٱللَّهَ) لەگەڵ (إِلَٰهَ) هەردووکیان بە خوا لێك دەدەنەوە، بۆ وێنە: دەڵێن: ﴿لَّآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱللَّهَ﴾، واتە: بێجگە لە خوا هیچ خوا نین! بەڵام ئەوە زۆر غەڵەتە، چونکە خوا ﷻ نەیویستوە بفەرموێ بێجگە لە خوا هیچ خوا نین! هەر (خوا) خوایە! چونکە هیچ کەسێك کێشەو مشتومڕی لەسەر ئەوە نەبووە کە دوو خوا (ٱللَّهَ) هەبن، هەر بۆیەش وشەی (ٱللَّهَ) نە (تَثنيَة) دەکرێ، نە دەکرێتە (کۆ)ش، وە هیچ کەسێك لە کافرەکان کێشەی لەسەر خوایەتی خواو پەروەردگارێتی خوا نەبووە، وەك دەفەرموێ: ﴿وَلَئِن سَأَلۡتَهُم مَّنۡ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ وَسَخَّرَ ٱلشَّمۡسَ وَٱلۡقَمَرَ لَيَقُولُنَّ ٱللَّهُۖ فَأَنَّىٰ يُؤۡفَكُونَ ٦١﴾ العنكبوت، واتە: وە ئەگەر لێیان بپرسی: کێ ئاسمانەکانو زەوی دروست کردوون؟ دەڵێن: خوا (ٱللَّهَ)، ئەدی کێشە لەسەر چی بووە؟ مشتومڕو کێشە لەسەر پەرستراوێتی خوا بووەو لە پەرستراوێتیدا هاوبەشیان بۆ خوا داناوە، نەك لە پەروەردگارێتیو لە خوایەتیدا، بەڵکو لە ئولوهییەتدا شەریكو هاوبەشیان بۆ بڕیار داوە، بۆیە خوا ﷻ لە قورئاندا ئەوەندە زۆر تەئکیدو جەخت دەکاتەوە لەسەر وەحدانیەتی خۆی لە پەرستراویەتیدا، کەواتە ﴿لَّآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱللَّهَ﴾، واتە: هیچ پەرستراو نین بێجگە لە خوا. نەك هیچ خوا نین بێجگە لە خوا، ئنجا دوای ئەوەی باسی یەکتایی خۆی دەکات لە پەرستراوێتیدا کە تەنیا خۆی پەرستراوە، واتە: وەك هەق تەنیا ئەو پەرستراوە، وەك شایستەیی تەنیا خوا ﷻ شایستەی پەرسترانە، ئەگەرنا بە ناهەق زۆر شتی دیکە دەپەرسترێ، ئنجا دێتە سەر باسی

---

١) پێشتریش باسم کردوە، بەڵام بۆ داکۆکیی لەسەر کردنو بیرخستنەوە.

پەروەردگارێتی خۆی، کە بۆچی دەبێ تەنیا خوا بپەرستری؟ چونکە تەنیا خوا پەروەردگارو بەدیهێنەرو خاوەنەو تەنیا خوا مشوورگێڕی ئەو کەون و کائیناتەیە، بۆیە دەبێ بەس ئەو بپەرستین، دەفەرموێ: ﴿إِنَّ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ﴾، بێگومان لە دروستکرانی ئاسمان و زەویدا (ئەوە دوو) ﴿وَاخْتِلَافِ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ﴾، لە جێگۆڕکەی شەوو ڕۆژاندا (ئەوە چوار) ﴿وَالْفُلْكِ الَّتِي تَجْرِي فِي الْبَحْرِ بِمَا يَنْفَعُ النَّاسَ﴾، ئەو کەشتییانەی کە لە دەریادا دەڕۆن، بە شێوەیەك کە بەرژەوەندییەکانی خەڵکی دابین دەکەن (ئەوە پێنج) ﴿وَمَا أَنْزَلَ اللَّهُ مِنَ السَّمَاءِ مِنْ مَاءٍ﴾، وە لەو ئاوەدا کە خوا لە ئاسمانەوە دەینێرێتە خوارێ (ئەوە شەش) ﴿فَأَحْيَا بِهِ الْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا وَبَثَّ فِيهَا مِنْ كُلِّ دَابَّةٍ﴾، واتە: زەوی پێ زیندوو دەکاتەوە، دوای ئەوەی کە مردووە، وە هەموو زیندەوەرێکی تێدا بڵاودەکاتەوە (ئەوە حەوت و هەشت) ﴿وَتَصْرِيفِ الرِّيَاحِ﴾، وە لە جۆراو جۆرکردنی بایەکاندا هەر جارەو ئاڕاستەیان بە جۆرەك پێ دەگۆڕێ و جۆراو جۆریان دەکات، هەیە نەرمە وەك شنەی (شەماڵ)، وە هەیە زۆر توندە وەك: (ڕەشە با)، (ئەوە نۆ) ﴿وَالسَّحَابِ الْمُسَخَّرِ بَيْنَ السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ﴾، وە ئەو هەورەی کە ڕامکراوەو دەستەمۆکراوەو هەڵواسراوە لەنێوان ئاسمان و زەویدا، ئەوە دە (١٠).

لەم دە (١٠) شتەدا ﴿لَآيَاتٍ لِقَوْمٍ يَعْقِلُونَ﴾ نیشانەو موعجیزەی زۆر هەن بۆ کەسانێك کە بفامن، واتە: ئەگەر دەپرسن لە نیشانەو بەڵگە لەسەر یەکتایی خوا لە پەرستراوێتیدا، ئەوە نیشانەو بەلگەکانی یەکتایی و تەنیایی خوایە لە پەرستراوێتیدا کە ئەو هەموو دیاردە سروشتییانەی خوڵقاندوون، ئاسمان زەوی، ڕۆژگار، شەوگار، کەشتییەکان، ئاوێك کە لە ئاسمان دێتە خوارو زەوی پێ زیندوو دەکاتەوە، وە زیندەوەرانی پێ بڵاودەکاتەوە بە زەویدا، (با) کە هەڵدەکات بە چەندان شێوە، وە ئەو هەورە کە هەڵواسراوە لە نێوانی ئاسمان و زەویدا، ئەوانە

هەمووی بەرهەمی کارگەی پەروەردگاریێتی خوان، بەڵام بۆ کێ؟ بۆ کەسانێك کە بفامن، وەك خوا ﷻ لە جێیەکی دیکە، دەفەرموێ: ﴿ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ بِغَيۡرِ عَمَدٖ تَرَوۡنَهَاۖ وَأَلۡقَىٰ فِي ٱلۡأَرۡضِ رَوَٰسِيَ أَن تَمِيدَ بِكُمۡ وَبَثَّ فِيهَا مِن كُلِّ دَآبَّةٖۚ وَأَنزَلۡنَا مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءٗ فَأَنۢبَتۡنَا فِيهَا مِن كُلِّ زَوۡجٖ كَرِيمٍ ﴿١٠﴾ ﴾لقمان، دوایی دەفەرموێ: ﴿ هَٰذَا خَلۡقُ ٱللَّهِ فَأَرُونِي مَاذَا خَلَقَ ٱلَّذِينَ مِن دُونِهِۦۚ بَلِ ٱلظَّٰلِمُونَ فِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٖ ﴿١١﴾ ﴾لقمان، واتە: ئا ئەوە دروستکراوی خوایە پێشانم بدەن ئەوانی دیکە {غەیری خوا} چییان دروستکردوە؟ واتە: کوا پەرێزو بەرهەمێکیان لە زەویدا لە ئاسماندا، کوا شوێنەوارێکیان، کوا دروستکراوێکیان؟! نیە، بێجگە لە خوا ﷻ هیچ کەس دەستی لە هیچ مەخلووقێکدا نیە، کەواتە: پێویستە بێجگە لە خوا ﷻ هیچ کەسی دیکە بەشی لە بەندایەتیی‌و پەرستنی ئینساندا نەبێ، مادام، هەر خوا بەدیهێنەرەو هەر خوا ﷻ مشوورخۆرەو ژیێنەرەو مرێنەرەو ڕۆزیدەرەو زیندووکەرەوەیەو هەمەکارەیە، کەوابێ دەبێ هەر ئەویش بەندایەتیی بۆ بکرێ بەمانای فراوانی بەندایەتیی، ئنجا دەفەرموێ: ﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَتَّخِذُ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَندَادٗا يُحِبُّونَهُمۡ كَحُبِّ ٱللَّهِۖ ﴾، دێتە سەر باسی ئەوانە کە هاوبەش بۆ خوا دادەنێن، واتە: وە لە خەڵکی هەن کەسانێك کە چەند هاوتایەك پەیدادەکەن بۆ خۆیان لەجیاتی خوا، خۆشیان دەوێن وەك خۆشویستراني خوا، واتە: وەك خوا ﷻ مامەڵەیان لەگەڵدا دەکەن، وەك چۆن خوا دەبێ لە هەموو کەس پتر خۆشبوویستریێ‌و، بە گەورەتر بگیرێ‌و، زیاتر ملی بۆ کەچ بکرێ‌و، پشتی پێ ببەسترێ‌و، ترس‌و سام‌و ڕێزو شەرمی بەرانبەر بنوێنرێ، ئەوانیش بەو شێوەیە مامەڵە لەگەڵ ئەو پەرستراوانەی خۆیاندا دەکەن. ﴿ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَشَدُّ حُبّٗا لِّلَّهِۗ ﴾، بەڵام ئەوانەی ئیماندارن خۆشەویستییان زیاترەو توندترە بۆ خوا، واتە: هەرچەندە ئینسان بێبڕوابێ‌و لە بێبڕواییدا ڕۆبچێ، بەڵام دیسان خۆشەویستی‌و پەیوەست بوونی بە پەرستراوەکەیەوە ناگاتە خۆشەویستی‌و پەیوەست بوونی ئیمانداران بە خواوە، بۆچی؟ چونکە پەیوەست بوونی

ئیمانداران بە خواوەو، خۆشەویستی ئیمانداران بۆ خوا، پەیوەندی هەیە بە ناخی دەروونیان، بە فیطرەتیان، بە عەقڵیانەوە، بۆیە ئەو شێوە خۆشویستنە لە دڵی ئەوانی دیکەدا پەیدانابێ کە غەیری خوا دەپەرستن، ئنجا دەفەرموێ:

﴿ وَلَوْ يَرَى ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓا۟ إِذْ يَرَوْنَ ٱلْعَذَابَ أَنَّ ٱلْقُوَّةَ لِلَّهِ جَمِيعًا وَأَنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعَذَابِ ﴾، وە ئەگەر ئەوانەی ستەمیان کردوە، کاتێك ئازارو سزای خوا دەبینن، وە دەبینن کە هێز هەمووی هی خوایە، وە دەبینن کە خوا ئازاری زۆر توندە {واتە: ئەگەر ئەوە دەبینن پەشێمان دەبنەوە لەوەی کە غەیری خوایان پەرستوە}، ئنجا خوا ﷻ ئەوەمان بۆ وێنا دەکات و دەفەرموێ: ﴿إِذْ تَبَرَّأَ ٱلَّذِينَ ٱتُّبِعُوا۟ مِنَ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوا۟ ﴾، کاتێك ئەوانەی کە پەیڕەوییان لێکراوە حاشا دەکەن لەوانەی کە شوێنیان کەوتوون ﴿ وَرَأَوُا۟ ٱلْعَذَابَ ﴾، وە ئازارو سزاو جەزرەبەی خوا دەبینن ﴿ وَتَقَطَّعَتْ بِهِمُ ٱلْأَسْبَابُ ﴾، هەموو پەیوەندییەکانیان لە نێواندا دەپچڕێ و کەس لە کەس ناپێچێتەوە ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوا۟ ﴾، وە شوێن کەوتووەکان دەڵێن: ﴿ لَوْ أَنَّ لَنَا كَرَّةً فَنَتَبَرَّأَ مِنْهُمْ كَمَا تَبَرَّءُوا۟ مِنَّا ﴾، (ئەوانەی کە پەیڕەوییان کردوە لە طاغووت و فیرعەون و خۆ بە خوا زانەکان)، دەڵێن: ئەگەر ئێمەش نۆرەیەکمان هەبووایەو جارێك گەڕابایینەوە بۆ دنیایەو بووباینە سەرکردەو ئەوان بووبان بە شوێن کەوتوومان، وە ئێمە حاشامان لێ کردبان، وەك چۆن ئەوان ئێستا حاشا لە ئێمە دەکەن، واتە شتێکی زۆر باش بوو، وا دیارە زۆریان لەسەر دڵ قورسە کە لە دنیادا پەرستوویانن و کۆیلایەتیی و خزمەتکارییان بۆ کردوون، بەڵام لە قیامەتێ حاشایان لێدەکەن و پەخەیان لەبەر دادەدرن، زۆریان پێ ناخۆشە، بۆیە دەڵێن: خۆزگە بۆ ئێمەش نۆرەیەکی وا هەبووایە، ئێمە بووباینە برا گەورەو ئەوان بووبانە شوێنکەوتەو، لێرەشدا ئاوا حاشامان لێ کردبان و پەخەمان لێ دادریبان و دەستمان بەڕووەوە نابان ! ئنجا خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿كَذَٰلِكَ يُرِيهِمُ ٱللَّهُ أَعْمَٰلَهُمْ حَسَرَٰتٍ عَلَيْهِمْ ﴾، ئاوا خوا کردەوە خراپەکانیان پێشان دەدا، کە

مایەی غەم‌و پەژارەی زۆرە بۆیان ﴿وَمَا هُم بِخَٰرِجِينَ مِنَ ٱلنَّارِ﴾، وە لە ئاگر دەرباز نابن‌و لێی ناچنە دەرێ، ئیدی ئاوا لە غەم‌و ناسوری خۆیاندا دەمێننەوە ! خوا بە لوتف‌و کەرەمی خۆی لەو کەسانەمان بگێڕێ کە بە هۆی ئیمان‌و کردەوەی باشەوە، شایستەیی چوونە بەهەشتیان دەبێ‌و بمانپارێزێ لە کردەوەی دۆزەخییان‌و لە سزای دۆزەخ.

## چەند مەسەلەیەکی گرنگ

**مەسەلەی یەکەم:** کە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿وَإِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَاحِدٌ﴾، پەرستراوی ئێوە یەك پەرستراوە، لێرەدا دوو ئیحتمال هەیە:

١- ئیحتمال هەیە: خوا ﷻ خەڵی بەگشتی دواندبێ، واتە: ئەی خەڵکینە ! ئەی مرۆڤایەتی ! پەرستراوی ئێوە یەك پەرستراوە ﴿لَّآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلرَّحْمَٰنُ ٱلرَّحِيمُ﴾، بێجگە لەو هیچ پەرستراوی دیکەنین بە بەزەیی بەخشندەیە، ئنجا ئایەتی دوایی کە دەفەرموێ: ﴿إِنَّ فِى خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱخْتِلَٰفِ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ ...﴾، تا کۆتایی ئایەتەکە، بەڵگەبێ بۆ خەڵکی کە ئەو دەعوایەی خوا ﷻ دەیکات‌و دەفەرموێ: پەرستراوی ئێوە یەك پەرستراوە، ئەوەش بەڵگەکەیەتی، چونکە تەنیا ئەو خوایە پەروەردگارە، کەواتە: دەبێ هەر ئەویش پەرستراوبێ.

٢- وە دەشگونجێ رووی دواندن (خطاب) لە مسوڵمانان‌و ئیمانداران بێ، واتە: ئەی ئیماندارینە ! ئەو پەرستراوەی کە ئەم فەرمایشتە ئاراستەی ئێوە دەکات یەکێکەو تەنیا ئەو شایستەی پەرسترانە کە خوایە (جَلَّ شأنُهُ).

**مەسەلەی دووەم:** لە مانای گشتییشدا باسکراوە، بەڵام ئەم مەسەلەیە چەند باس بکرێ کەمە: ئەگەر تەماشای قورئان بکەین، دەبینین زۆر جەخت کراوە لەسەر یەکتایی خوا لە پەرسترانیدا، بۆچی؟ چونکە کێشەو مشتومڕی

پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) بە درێژایی مێژوو لەگەڵ خەڵکیدا لەسەر پەرستنی خواو لەسەر پەرستراوێتی خوا بووە، نەك لەسەر بەدیهێنەرایەتیو پەروەردگارێتی خوا، ئەوە کە خوا ﷻ تاکە بەدیهێنەرەو تاکە پەروەردگارەو تاکە خاوەنە، مشتومڕێکی وای لەسەر نەبووە، دانیان پێداهێناوە، بەڵام کە هاتوونەتە سەر ئەوە چۆن مامەڵە لەگەڵ خوادا بکەن، ئایا هەر ئەو بپەرستن، یاخود هەندێك شەریكو هاوبەشانیشی بۆ پەیدا بکەن؟ لێرە دایە کە مرۆڤایەتی سەری لێ تێکچووە بە فەیلەسووفەکانی یۆنانیشەوە وەك: سوقراطو ئەرسطۆو ئەفلاطوون، کە هەندێ خەڵك دەڵێن: گەورەترین عەقڵ بوون لە مێژووی بەشەردا، کە بە دڵنیایی یەوە وانیە، تەماشا دەکەی هەموویان بتپەرست (وَثَنِي) بوونو بڕوایان بە چەند پەرستراویی (تَعَدُّد الآلِهَة) هەبووەو ئێستاش لە کەلەپووری یۆنانیدا دەڵێن: (إله الجمال)، (إله المطر)، (إله الشرّ)، (إله الخير)، کە لە کتێبە کوردییەکان وشەی (إله) بە (خوا) تەرجەمە دەکەنو دەڵێن: خوای جوانیی، خوای باران، خوای شەڕ، خوای خێر، نازانم خوای چی... ! وە من لە کتێبی (ئیمانو عەقیدەی ئیسلامیی)دا باسم کردوە کە ئەوە غەڵەتە، چونکە یۆنانییەکان وشەی (إله) واتە: پەرستراو بەکاردێنن، یان وشەی (رَبّ) بەکاردێنن، واتە: پەروەردگار، وە وشەی خوا (اللهَ) یان بەکارهێناوە، جا وشەی خوا (الله) کۆناکرێتەوەو وشەی: خوایەکان غەڵەتە، چونکە خوا (اللهَ)، یەکەو ناکرێتە دووو ناشکرێتە سێ، کەواتە: دەگونجێ بڵێی: پەروەردگارەکان، وەك لە قورئاندا دەفەرموێ: ﴿ ...ءَأَرْبَابٌ مُّتَفَرِّقُونَ... ﴿٣٩﴾ ﴾ یوسف، هاتوە، چونکە (رَبّ) بە (أَرْبَاب) کۆدەکرێتەوە هەروەها (إله) بە (آلِهَه) کۆدەکرێتەوە، پەرستراو: پەرستراوەکان، پەروەردگار: پەروەردگارەکان، بەڵام خوا (اللهَ) ﷻ هەر تاکەو کێشەو مشتومڕیش لەسەر ئەوە نەبووە کە کەسانێك پێیان وابوو بێ دوو خوا هەن ! تەنانەت ئێزیدییەکانیش کە ئیبلیس دەپەرستن، یان بە پیرۆزی دەزانن، ئەوانیش دەڵێن: هەر خوا پەروەردگارو بەدیهێنەرو خاوەنە،

بەلاّم (مَلَک طَاوس) کە (ئیبلیس)ەو ئەوان پێی دەلێن: (مَلَک طَاوس) دەلێن: بۆیە ئێمە رێزی لێ دەگرین، چونکە ئامادە نەبووە کڕنووش بۆ غەیری خوا بەرێ، هێندەی خوا لەلا گەورە بووە ! کە بێگومان پاساودانەوە (تَعلِیل)ە کەشیان غەلّەتە، چونکە خوا ﷻ نەیفەرموە کڕنووشی پەرستن بۆ ئادەم بەرە ! بەلّکو فەرموویەتی: ڕێز لە ئادەم بگرەو کڕنووشی ڕێزلێگرتنی بۆ بەرە، کەواتە: دەبێ خەلّکی ئێزیدیی ئیبلیس زۆر ببوغزێنن، چونکە ئێستا زۆر باسی مافی مرۆڤ دەکرێت و ئیبلیس ئامادە نەبووە ڕێز لە بابی مرۆڤان بگرێ ! بەلێ مەسەلەی یەکتایی خوا لە پەرستراندا ﷻ بەڕاستی شەڕگەی نێوان کافرو پێغەمبەران بووە (علیهم الصلاة والسلام)، بە تایبەتی فیرعەون و نەمروودو ئەوانە، کە خۆیان لە خەلّکی کردۆتە پەروەردگارو پەرستراو بۆچی؟ چونکە ئەگەر ئەوەی پێغەمبەران دەیلێن: (علیهم الصلاة والسلام) بچەسپێ و تەنیا خوا پەرستراوبێ، کوا ڕێی فیرعەون دەبێ بلّێ: ﴿ أَنَا۠ رَبُّكُمُ ٱلۡأَعۡلَىٰ ﴿٢٤﴾ ﴾النازعات، واتە: من پەروەردگاری هەرە بەرزتانم، یان کوا ڕێی نەمروود دەبێ بلّێ: ﴿ ... أَنَا۠ أُحۡيِۦ وَأُمِيتُۖ ... ﴿٢٥٨﴾ ﴾ البقرة، واتە: من دەژیێنم و دەمرێنم، یان ڕێی دەبێ فیرعەون بلّێ: ﴿ قَالَ لَئِنِ ٱتَّخَذۡتَ إِلَٰهًا غَيۡرِي لَأَجۡعَلَنَّكَ مِنَ ٱلۡمَسۡجُونِينَ ﴿٢٩﴾ ﴾الشعراء، واتە: ئەگەر جگە لەمن پەرستراوێکی دیکەت هەبێ ڕەگەلّ زیندانییانت دەخەم! مادام تەنیا خوا پەرستراو پەروەردگاربێ، تازە ڕێ گیرا لە فیرعەون و نەمروودو هەموو خۆ بەزلگرەکان، کە خۆ لەسەر خەلّکی بکەنە فیرعەون طاغووت و نەمروودو کەلّەگا ! هەر بۆیەش دوژمنی سەرسەختی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) کێ بوون ؟ ئایا خەلّکی ڕەش و ڕووت بووە؟ نەخێر، بەلّکو خۆ بەزلگرەکان (مُستکبِرین)و خۆشگوزەرانەکان (مُترَفِین) بوون، چونکە بەرژەوەندیی سیاسیی و ئابووریان لێ تێکدەچوو، بەلێ ئەگەر پەیامی پێغەمبەران بچەسپێ، دادگەریی دێتە گۆڕێ و

چەوساندنەوەی ئینسان بۆ ئینسان نامێنێ‌و، ئینسان ئینسان دەبێ‌و، خەڵك تەنیا بەندەی خوا دەبێ‌و هەندێكی نابێتە كۆیلەو خزمەتكاری هەندێكی.

**مەسەلەی سێیەم:** ئەهلی عیرفان‌و تەصەووف نەقڵیان كردوە لە (شیبلی)یەوە كە یەكێك بووە لە موتەصەووفین، (خوا لێی خۆشبێ)و گوایە نەیگوتوە: (لا إلَه إلاّ الله) جا لێیان پرسیوە: بۆ وا ناڵێی؟ گوتوویەتی: دەترسم فریا نەكەوم‌و كە گوتم: (لا إلَه)، بەر لەوەی بڵێم: (إلاّ الله) ڕووحم دەربچێ! مانای وایە كافر دەبم!

بەڵام (القُرطُبي) لە تەفسیرەكەی خۆیدا قسەیەكی جوان دێنێ، وەك نوكتەیەك دەڵێت[1]: ((وهَذَا مِنْ علومهم الدَقِيقَة الَّتي لَيْست لَهَا حَقِيْقَة))، واتە: ئەمە لە زانستە وردەكانیانە كە هیچ حەقیقەتی نیەو هیچی لە باراندانیەو هیچ نێوەڕۆكی نیە، بۆچی؟ دەڵێ: خوا ﷻ بۆخۆی فەرموویەتی بڵێن: (لا إلَه إلاّ الله)، جا ئەوە ئەگەرێكی زۆر دوورە كابرا بڵێ: (لا إلَه) وە ڕووحی دەربچێ! ئنجا گریمان ئەوە ڕووحیشی دەرچوو، مادام تەوحیدو عەقیدەكەی لە دڵدا هەبێ، بەوە كافرنابێ كە فریای ناكەوێ، جا صۆفییەكان جارجار ئاوا قسەی سەیرو سەمەرەیان هەیە كە لەڕووی شەرعییەوە هیچ نین!

**مەسەلەی چوارەم:** ئەوەیە كە خوا ﷻ خۆی بەچی دەناسێنێ؟! دەفەرموێ: ﴿لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلرَّحۡمَٰنُ ٱلرَّحِيمُ﴾، واتە: بە ﴿ٱلرَّحۡمَٰنُ ٱلرَّحِيمُ﴾، بە بەزەیی بەخشندەیە، بە سۆزو بەزەیی خۆی دەناسێنێ، ئەوەش لێی وەردەگیرێ كە بە ڕاستی خوا ﷻ لەگەڵ بەندەكانیدا، زیاتر لەسەر بناغەی بەزەیی مامەڵە دەكات، لەسەر بناغەی بەخشندەیی‌و كەرەم‌و لوتفی مامەڵەیان لەگەڵدا دەكات، مەگەر كەسێ بۆخۆی عاسێ بێ‌و لاڕێی بێ‌و تووڕەیی‌و غەزەبی خوا بۆخۆی بێنێ، ئەگەرنا خوای بە بەزەیی پێی خۆشە كەرەم‌و بەزەیی لەگەڵ خەڵكدا

---

١) بڕوانە: (الجامع لأحكام القرآن)، ج: (٢)، ص: (١٧٠).

بەکاربێنێ، وەك فەرموویەتی: ﴿...وَرَحْمَتِي وَسِعَتْ كُلَّ شَيْءٍ...﴿١٥٦﴾﴾ الأعراف، واتە: بەزەیی من هەموو شتێکی گرتۆتەوە، وە ئەوەشی لێ وەردەگیرێ کە ئێمەی مسوڵمانانیش بەڕاستی پێویستە لە هەڵسوکەوتماندا لەگەڵ خەڵکدا زیاتر لەسەر بناغەی ڕەحمو بەزەیی مامەڵە بکەین، چونکە ئیماندارانیش دەبێ تەماشا بکەن و هەوڵبدەن سیفەتە بەرزەکانی خوا ئەوانەی کە لەگەڵ ئینساندا دەگونجێن لە خۆیاندا بیانهێنینەدی، وەك پێغەمبەر ﷺ لە فەرمایشتێکیدا فەرموویەتی: {(... ارْحَمُوا مَنْ فِي الأَرْضِ، يَرْحَمكُم مَنْ فِي السَّمَاءِ...) (رَوَاهُ أَبُودَاوُدَ برقم: (٤٩٤١)، وَالتِّرمِذِيّ برقم: (١٩٢٤)، وَقَالَ: حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَالحَاكِمُ برقم: (٧٢٧٤)، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو رضي الله عنه، وَصَحَّحَهُ الأَلباني في (السلسلة الصحيحة) برقم: (٩٢٥)}، واتە: بەزەییتان بەوانەدا دابێتەوە کە لەسەر زەویین ئەوەی کە لە ئاسمانە (لە سەرووتانەوەیە) بەزەیی پێتان دادێ، واتە ئێوەش وەك چۆن خوا ڕەحمەتی هەیە، ڕەحمتان هەبێ، بەرانبەر بە غەیری خۆتان، خوای پەروەردگاریش بەزەیی لەگەڵ ئێوەدا دەبێ.

**مەسەلەی پێنجەم:** کە دەفەرموێ: ﴿إِنَّ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَاخْتِلَافِ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ وَالْفُلْكِ الَّتِي تَجْرِي فِي الْبَحْرِ بِمَا يَنفَعُ النَّاسَ وَمَا أَنزَلَ اللَّهُ مِنَ السَّمَاءِ مِن مَّاءٍ فَأَحْيَا بِهِ الْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا وَبَثَّ فِيهَا مِن كُلِّ دَابَّةٍ وَتَصْرِيفِ الرِّيَاحِ وَالسَّحَابِ الْمُسَخَّرِ بَيْنَ السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَعْقِلُونَ﴾، لەم ئایەتە بە پێزەدا خوا ﷻ دە (١٠) دیمەن و تابلۆی زۆر سەرنجڕاکێش دێنێتەوە لەسەر ئیسپاتی پەروەردگاریتی خۆی وە ئەمە شێوازی قورئانەو هەمیشە قورئان دێنێت دەستی ئینسان دەگرێت بە نێو دیاردەو دیمەنە سەرنجڕاکێش و دڵڕفێنەکانی کائیناتدا دەیگێڕێ و، دەڵێ: خاوەنی ئەمانەو بەدیهێنەرو پەروەردگاری ئەم دیمەنانە خوا (الله)یە (جَلَّ شَأْنُهُ)، بۆیە ئێمە وەك مسوڵمان دەڵێین: هەتا زانیاری بەرەو پێشەوە بچێت، بە دڵنیاییەوە ئیمان

قازانج دەکات، وەك خوای زانا لە کۆتایی سوورەتی (فصلت)دا فەرموویەتی: ﴿ سَنُرِيهِمْ ءَايَٰتِنَا فِى ٱلْءَافَاقِ وَفِىٓ أَنفُسِهِمْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ ٱلْحَقُّ ...﴿٥٣﴾ ﴾، واتە: لەمەو دوا نیشانەکانی خۆمانیان پێشان دەدەین لە ئاسۆیەکانداو لە نەفسی خۆشیاندا، تاکو بۆیان دەردەکەوێ کە ئەو (قورئان)ە هەقە، لە ئاسۆیەکاندا زانیاری گەردوونناسیی‌و کیمیاو فیزیا ... هەتا ئەوانە بەرەو پێشەوە بچن نهێنییەکان زیاتر دەردەکەون، وە لە نەفسی خۆشیاندا هەتا زانستی پزیشکیی (طبي)و دەروونناسیی‌و توێکاریی‌و ئەوانە بەرەو پێشەوە بچن زیاتر زانیاری‌و بەرزیی‌و گەورەیی‌و پەروەردگاریێتی خوا دەردەکەون، ئەو دە نیشانەیەش کە خوا ﷻ باسیان دەکات بریتین لە :

یەکەمیان: ئاسمان، ﴿ إِنَّ فِى خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ ﴾: ئاسمانەکان، ئێمە تا ئێستا نازانین چۆنن‌و چەندن! بەڵام خوا هەواڵی پێداوین کە حەوت ئاسمانی لەسەر یەکن، وەك خوای زاناو شارەزا دەفەرموێ: ﴿ ٱلَّذِى خَلَقَ سَبْعَ سَمَٰوَٰتٍ طِبَاقًا ...﴿٣﴾ ﴾ الملك ، بەڵام ئێمە نازانین ئەو حەوت ئاسمانە چۆنن؟ مەگەر لە ڕێگای وەحییەوە، هەندێ زانیارییمان پێگەیشتبێ، واتە: لە ڕێگای قورئان، یان لە ڕێگای فەرموودەکانی پێغەمبەرەوە ﷺ، ئەگەرنا ئێمە هیچی لێ نازانین، چونکە زانیاری بەشەر تا ئێستا نەگەیشتۆتە سنووری ئاسمانی یەکەمیش، بە بەڵگەی ئەو ئایەتەی کە دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ زَيَّنَّا ٱلسَّمَآءَ ٱلدُّنْيَا بِمَصَٰبِيحَ ...﴿٥﴾ ﴾ الملك، واتە: ئاسمانی نزیك لە ئێوەمان ڕازاندۆتەوە بە چرایان. (واتە: بە ئەستێران)، کەواتە: ئەوەی بە دووربین‌و تەلسکۆبەکان دەبینرێ، ئەو هەمووە کەهکەشانانە کە هەر کەهکەشانێك بە ملیۆنان ئەستێرەی تێدایە، هەموو ئەو کەهکەشانانەو هەموو ئەستێرەکان‌و خڕۆکەکانیان، دەکەونە سنووری ئاسمانی یەکەم، چونکە خوا دەفەرموێ: ئاسمانی یەکەم‌و ئاسمانی نزیك ئێوەمان ڕازاندۆتەوە بە چرایان، کەواتە:

هەمووی دەگەوێتە جوغزو سنووری ئاسمانی یەکەم، ئنجا نازانین ئەم سنوورەش لە کوێ کۆتایی دێت، وە پاشان سنووری ئاسمانی دووەمو سێیەم ... ئەوانەش لە کوێ دەست پێ دەکات ؟

دووەمیان: زەوی: ﴿ وَٱلْأَرْضِ ﴾، ئنجا باسی زەوی دەکات کە نیشانەیە لەسەر پەروەردگاریێتی خواو دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ فِى خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ﴾، ئەم زەوییە بە قەوارە زۆر بچووکە، بەڵام زۆر نایابە، ئێستا باس دەکەن ڕەنگە لە مەریخو لە کوێو لە کوێ دا ... ژیان هەبێت ئەوە هەمووی خەیاڵ پڵاوە، خوا تەنیا ئەم زەوییەی داناوە بۆ ژیانی ئینسانو بەس دەتوانێ لەسەر ئەم زەوییە بژیەتو، لە هیچ شوێنی دیکە ناتوانێ بژیەتو، خوا ئەوەی بڕیوەتەوە، وەك فەرموویەتی: ﴿ مِنْهَا خَلَقْنَٰكُمْ وَفِيهَا نُعِيدُكُمْ وَمِنْهَا نُخْرِجُكُمْ تَارَةً أُخْرَىٰ ﴿٥٥﴾ ﴾طـه، واتە: لە زەوی دروستمان کردوونو، دەشتانگێڕینەوە بۆ نێویو، هەر لەویش دەرتان دێنینەوە، ئەوەی دەچێتە سەر مانگیش دەبێ بەپەلە پرووزە بێتەوە پێش ئەوەی ئۆکسجینی لێ ببڕێ ! بەڵێ ئەم زەوییە بۆ ژیانو مردنو زیندووبوونەوەی ئێمەیە، ئەم زەوییە سەرسوڕهێنەرەی کە خوای پەروەردگار چەند هۆکاری گرنگو سەرسوڕهێنەری تێدا ڕەخساندوون، بۆ ئەوەی بە کەڵکی ئەوەبێ کە ئینسان بتوانێ تێیدا بژی:

١/ تیشکی ڕۆژ ئەندازەکەی وانیە کە ئینسان بسووتێنێو هێندەش نیە، کە دنیا هەمووی ببێتە بەستەڵەك.

٢/ ئنجا قەبارەی زەویو هێزی کێشندەی زەوی، کە بۆ هەر سانتیمەتر دووجایەك کیلۆ گرامێکەو ئەگەر کەمتربا، یان زیاتر بە کەڵك نەدەهات.

٣/ بەڵام (مانگ) هێزی کێشندەی کەمەو ئینسان، کە دەچێتە ئەوێ کێشی کەم دەبێتو، هەنگاوی داوێ وەك بازدان وایە، جا ئەگەر لەسەر زەوی وابایـن دەبا چۆن ژیابایـن؟! وە لە هەندێ لە خرۆکەکان هێزی کێشکردن ئەوەندە بەهێزە هیچ شتێك ناتوانێ بجوولێ.

٤/ ئنجا رێژەی توخمەكانی هەوا: ئۆكسجین (٢١٪) لە سەددا بیستو یەكە، دووەم ئۆكسیدی كاربۆن (٠,٠٣٪) لە سەددا سفرو لە سەددا سێیە، ئنجا نایترۆجین (٧٨٪) لە سەددا حەفتاو هەشتە، كە ئەگەر رێژەی ئەم توخمانەی هەوا هەر كامێكیان زیاتر یان كەمتربا، بە كەڵك نەدەهات.

٥/ وە هەروەها دووریی‌و نزیكیی مانگ‌و زەوی لە یەكدی.

٦/ وە سووڕانەوەی زەوی بە دەوری خۆیدا، كە هەر (٢٤) بیستو چوار سەعاتێك جارێك بە دەوری خۆیدا دەسووڕێتەوە، دەبێتە هۆی دروستبوونی شەو ورۆژ.

٧/ وە سووڕانەوەی بە دەوری خۆردا لە ماوەی ساڵێكدا، كە دەبێتە هۆی پەیدابوونی كەشەكانی ساڵ.

سێیەم‌و چوارەم: جیاوازیی شەوو رۆژ: ﴿ وَٱخۡتِلَٰفِ ٱلَّيۡلِ وَٱلنَّهَارِ ﴾، ئەگەر زەوی خێراتر سووڕابایەوە، شەوو رۆژ كورتتر دەبوون، وە ئەگەر سستر سووڕابایەوە، درێژتر دەبوون، وەك خرۆكەی واهەیە بە شەش مانگ جارێك دەسووڕێتەوە، وە هەروەها گەلێك لە وردەكاریی دیكە، كە خوای كاربەجێ لە زەویدا داینـاون، تاكو بە كەڵكی ژیان بێ.

پێنجەم: كەشتییەكان: ﴿ وَٱلۡفُلۡكِ ٱلَّتِي تَجۡرِي فِي ٱلۡبَحۡرِ بِمَا يَنفَعُ ٱلنَّاسَ ﴾، ئنجا ئەو كەشتییانەی كە بە دەریادا دەڕۆن‌و كە زۆر بەرژەوەندیی خەڵكی دابین دەكەن، نەك هەر لە رۆژگاری زوودا ئێستاش زۆربەی بازرگانیی‌و زۆربەی گواستنەوەی كەل‌وپەل لە رێگای كەشتی‌و دەریاكانەوەیە، كە كەشتی وا هەیە بەقەدەر شارێكە، ئێمە لە ساڵی (١٩٩٨)دا بە كەشتییەك لە (ماڵتا)وە چووین بۆ (بنغازي) لە لیبیا، كە لە چاو كەشتییە گەورەكان كەشتیەكی مام ناوەنجی بوو، دوو هەزار كەسی تێدابووو حەوت قات بوو.

شەشەم: ئەو ئاوەی كە ئاسمانەوە ناردوویەتە خوار: ﴿ وَمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مِن مَّآءٖ ﴾، تەماشا بكەن نەیفەرموە: (مِنْ مَطَرٍ) بەڵكو فەرموویەتی: (مِن مَّآءٖ) بۆچی؟ بۆ ئەوەی بارانیش‌و بەفریش‌و تەزرەش بگرێتەوە، لە قورئاندا بە زۆری

دەفەرموێ: (مَّآءٍ) وەك لە سوورەتی (الفرقان)دا، هاتوە: ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِىٓ أَرْسَلَ ٱلرِّيَٰحَ بُشْرًۢا بَيْنَ يَدَىْ رَحْمَتِهِۦ ۚ وَأَنزَلْنَا مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً طَهُورًا ﴿٤٨﴾ ﴾.

حەوتەم: زیندووکردنەوەی زەوی: ﴿ فَأَحْيَا بِهِ ٱلْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا ﴾، تەماشا دەکەی بارانێك دەبارێ ئەو زەوییە قاقڕو دێمەکارو وشکە، کە هیچ نیشانەی ژیانی تێدانیە، هەر ئەوەندە دەبینی جمموجۆڵی ژیانی تێدا پەیدادەبێت، گژوگیا سەردەردێنێ، مێش و مەگەزو پەپوولەو زیندەوەرەکان وردە وردە دەبووژێنەوە پەیدادەبن، درەخت چرۆ دەکات... هتد.

هەشتەم: بڵاوکردنەوەی هەموو جۆرە زیندەوەرێك: ﴿ وَبَثَّ فِيهَا مِن كُلِّ دَآبَّةٍ ﴾، واتە: دوای ئەوەی کە ئەو بارانە هاتە خوارێ چەندان جۆرە زیندەوەری پێ بڵاودەکاتەوە، لە زەوییدا.

نۆیەم: گۆڕین و وەرسووڕاندنی بایەکان: ﴿ وَتَصْرِيفِ ٱلرِّيَٰحِ ﴾، کە جاری وایە بایەکی شەماڵەو جاری وایە بایەکی زۆر توندە، کە وەك گسك لێدان وایە بۆ سەر زەوی، وە خوا ﷻ سەر زەوی بە سێ چوار شت پاك دەکاتەوە:

أ) تیشکی خۆر کە گۆڕانی کیمیایی بەسەر زۆر شتدا دێنێت و پاکی دەکاتەوە.

ب) ئاو کە دەبێتە هۆی داشۆرینی سەر زەوی.

ج) با کە دەبێتە هۆی گسك لێدانی سەر زەوی.

د) خاك، گڵ کە لە ڕێی تەفاعول لەگەڵکردنەوە، زۆر شتی پیس و بۆگەن، وەك کەلاك و ئەوانە دەگۆڕێ و نایهێڵێ.

دەیەم: هەور: ﴿ وَٱلسَّحَابِ ٱلْمُسَخَّرِ بَيْنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ ﴾، ئەو هەورەی کە لە نێوانی ئاسمان و زەویدا ڕام و دەستەمۆ کراوەو ڕاگیراوە، کە پڕە لە ئاو، چەند تەن ئاو هەڵدەگرێ، کەچی (سُبْحَانَ اللهِ) ئەو بایە کە دەڵێی ڕووحە ئەوەندە سووکە، ئەو هەورە قورسانە هەڵدەگرێ و دوایی دێتە خوار، هەڵبەتە ئێمە دوایی

لە ئایەتەکانی دیکەدا کە لە دەرسەکانی دیکەدا دەیانگەینێ (إن شاء الله) بە درێژیی باسی باران بارین دەکەین، جا خوا ﷻ دەفەرموێ: لە هەموو ئەوانەدا بەڵگەو نیشانە هەن ﴿لَآيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ يَعۡقِلُونَ﴾، بۆ کەسانێك کە بفامن، هەر تۆزێك عەقڵیان هەبێو بەکاری بێنن، دڵنیا دەبن کە ئەوانە هەموویان نیشانەو بەڵگەن، لەسەر پەروەردگاریێتی خواو لەسەر یەکتایی خوا لە پەرستراندا.

**مەسەلەی شەشەم:** کە دەفەرموێ: ﴿لَآيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ يَعۡقِلُونَ﴾، واتە مرۆڤ هەر زۆریش بیرنەکاتەوەو زۆریش ڕانەمێنێو ورد نەبێتەوە، هەر نەختێك عەقڵی هەبێ، دەزانێ کە ئەم ئاسمانو زەویو، شەوو ڕۆژو، کەشتی نێو دەریاو، بارانو بەفرو تەرزەو، زیندووبوونەوەی زەوی بەهۆی بارانەوەو با کە هەڵدەکاتو هەوری هەڵواسراو... دەستی کارسازێکیان لە پشتەوەیە.

بۆ وێنە: تۆ دەچیتە هوتێلێك جێیەکی لێیە لە ژوورێکداو، گڵۆپێك لەوێ پێیەو پانکەیەكو چەند کەلوپەلێکی دیکە دانراون، دیارە هەرگیز بەخەیاڵت دانایە بڵێی: ئەوە لە خۆڕا دروست بووە، کەس بە خەیاڵی دادێ ؟ یان دەچیتە چێشتخانەیەك ئاوت بۆ دێننو زەلاتەت بۆ دێننو، کەوچكو چەنگاڵو قاپو نان، ئایا هیچ کەس هەرگیز بەخەیاڵیدا هاتوە بڵێ: لەخۆڕا ئەو شتانە هاتوونو، لێرە ڕیزبوون ؟! نەخێر، ئەدی خوا ﷻ کە ئەم دنیایەی بۆ ئێمە کردۆتە هوتێلو، بۆشی کردووینە چێشتخانە، ئنجا زۆریش لە هوتێلو چێشتخانە گەورەترو گرنگترە، چۆن دەبێ وەستایەكو کارسازێكو مشوورخۆرێکی نەبێ ؟!

**مەسەلەی حەوتەم:** کە دەفەرموێ: ﴿وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَتَّخِذُ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَندَادٗا﴾، وشەی (يَتَّخِذُ) (افتعَال)ە لە (أَخَذَ يَأخذُ) کە بریتیە لەوەی شتێك بۆخۆت بگری، وەك بڵێی بە تۆبزیی بیگری، یانی: ئەوانە پەرستراونینو هاوتانین بۆ خوا، بەڵام ئەوان بە تۆبزیی دەیانکەنە هاوتای خوا، لە خەیاڵو ئەندێشەی خۆیاندا، ئەگەرنا لە واقیعدا خوا هاوتای نیە ﴿... سُبۡحَٰنَ ٱللَّهِ عَمَّا يَصِفُونَ ۝٩١﴾ المؤمنون.

**مەسەلەی هەشتەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ يُحِبُّونَهُمْ كَحُبِّ اللَّهِ ﴾، ئەوانەی کە جگە لە خوا هەندێ پەرستراوان پەیدا دەکەن، وەك خوا خۆشیان دەوێن‌و دەیانپەرستن، ئەوەی لێ وەردەگیرێ کە تایبەتمەندترین سیفەتی پەرستراو ئەوەیە کە خۆشبویستریێ، خۆشویستنی بەندە بۆ خوای پەروەردگارو تاکە پەرستراوی، کرۆك وکاکڵی بەندایەتییەکەیەتی، بەڵگەش لەسەر ئەوە کە پەرستراو دەبێ خۆشبویستریێ، ئەوەیە کە لە سووڕەتی (الأنعام)دا خوا باسی ئیبراهیم ﷺ دەکات بەم شێوەیە: ﴿ فَلَمَّا جَنَّ عَلَيْهِ اللَّيْلُ رَءَا كَوْكَبًا قَالَ هَٰذَا رَبِّي فَلَمَّا أَفَلَ قَالَ لَا أُحِبُّ الْآفِلِينَ ﴿٧٦﴾ ﴾ الأنعام، واتە: کاتێك شەوگاری بەسەرداهات ئەستێرەیەکی لێ دەرکەوت گوتی: ئەوە پەروەردگارمە، کاتێك ئاوابوو گوتی: من ئاوابووانم خۆشناوێن، (واتە: من کەسێك دەپەرستم خۆشم بوێ، بەڵام ئەوەی ئاوابێ خۆشم ناوێ)، مەبەستم ئەوەیە کە مەسەلەی خۆشویستنی خوا ﷻ، مەسەلەیەکی زۆر گەورەو گرنگە، وە هیچ کەسێك هیچ شتێك ناپەرستێ تا خۆشی نەوێ بەپێی ئەم ئایەتە، وە لە واقیعیشدا هەروایەو هەر کەسێك پارە دەپەرستێ، دیارە خۆشی دەوێ‌و هەرکەسێ حیزبێك دەپەرستێ، دیارە لە هەموو شتێك زیاتری خۆشدەوێ، هەروەها کەسێك طاغووتێك دەپەرستێ، هەواو ئارەزووی خۆی دەپەرستێ، مانگ‌و خۆر دەپەرستێ، دیارە خۆشی دەوێ‌و چاوەڕێی خێرو خۆشیی لێدەکات، بۆیەش دەیپەرستێ، لە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعودەوە گێردراوەتەوە کە پرسیاری کردوە لە پێغەمبەر ﷺ: {(قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ ﷺ أيُّ ذَنبٍ أَعْظَمُ؟ قَالَ: أَنْ تَجْعَلَ للهِ نِدًّا وَهُوَ خَلَقَكَ) (رَوَاهُ أَحْمَد برقم: (٤٤٢٣)، وَالبُخَارِيُّ برقم: (٤٤٧٧)، وَمُسْلِم برقم: (٨٦)، وَأَبُودَاوُدَ برقم: (٢٣١٠)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٣١٨٢)، وَالنَّسَائِيُّ برقم: (٤٠٢٤))}، واتە: گوتم، ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ چ گوناهێك لە هەموو گوناهان گەورەترە؟ فەرمووی: ئەوە کە هاوتاو هاوبەش بۆ خوا دابنێی، لە حاڵێکدا، کە هەر ئەو تۆی دروستکردوە.

**مەسەلەی نۆیەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ وَالَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَشَدُّ حُبًّا لِّلَّهِ ﴾، ئەوانەی بڕوایان هێناوە خۆشەویستییان بۆ خوا توندترو زیاترو تۆخترە، ئەوە دەگەیەنێ، کە بەڕاستی نابێ هیچ کەسێك بەقەدەر ئەوەی کە مسوڵمان خوای خۆشدەوێ، وە لەپاش خوا پێغەمبەری ﷺ خۆشدەوێ، نابێ هیچ کەس هەبێ پەرستراوی خۆی‌و پێشەوای خۆی هێندە خۆشبوێ، هەر بۆیەش هەرکاتێك بەڕاستی مسوڵمانان ئیماندار بووبن‌و ئیمانیان لە دڵدا چەسپیبێ، هیچ کەس نەیتوانیوە، لە هیچ بوارێکدا پێشبڕکێیان لەگەڵدا بکات، چونکە ئینسان کە بەڕاستی ئیمانی هەبوو، واتە: خوای لە هەموو کەس‌و لە هەموو شتێ خۆشتر دەوێ، کەواش بوو مانای وایە تۆی بڕوادار ئامادەی لە پێناوی خوادا هەموو شتێ بەختبکەی‌و، هەموو شتێ بۆ خوا بکەی، جا چ لە بواری ئاشتیدا، وەك پەیداکردنی زانیاریی‌و بڵاوکردنەوەی‌و ئاوەدانکردنەوەی سەر زەوی‌و، بەرەو پێشبردنی ژیان‌و گوزەران‌و، چەسپاندنی دادگەریی، وە چ لە بواری جەنگ‌و جیهاددا، وەك ڕووبەڕووبونەوەی دوژمنان‌و دیفاع کردن لەسەر زەمین‌و وڵات‌و دین‌و ژین‌و حورمەت‌و...هتد. بەڵێ بەمەرجێك مسوڵمانان خاوەنی ئیمان بن، هیچ کەسێك باریان نابا، نە لە بواری ئاشتیداو نە لە بواری جەنگدا، وە لەوبارەوە کە مسوڵمانان دەبێ خواو پێغەمبەری خوایان لە هەموو کەس‌و هەموو شتێك خۆشتربوێ ئەم فەرموودەیە هەیە: {(عَنْ أَنَس رَضِيَ اللهُ عَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: ثَلاَثٌ مَنْ كُنَّ فِيهِ وَجَدَ حَلاَوَةَ الإِيمَانِ: أَنْ يَكُونَ اللهُ وَرَسُولُهُ أَحَبَّ إِلَيهِ مِمَّا سِوَاهُمَا، وَأَنْ يُحِبَّ الـمَرْءَ لاَيُحِبُّهُ إِلاَّ لِلَّهِ، وَأَنْ يَكْرَهَ أَنْ يَعُودَ فِي الكُفْرِ بعد أن أنقذه الله منه، كَمَا يَكْرَهُ أَنْ يُقْذَفَ فِي النَّارِ) (رَوَاهُ البُخَارِيُّ بِرقم: (١٦)، وَمُسْلِم بِرقم: (١٦٤)، وَالتِّرمِذِيّ بِرقم: (٢٦٢٤))}، واتە: ئەنەس خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: سێ شت لە هەرکەسێدا هەبن ئەوا شیرینی ئیمانی بە هۆی ئەو سێ شتانەوە چێشتوە: کە خواو پێغەمبەری خوای لە غەیری خۆیان خۆشتربوێ (هیچ شتێکی بە قەدەر خوا، وە پاشان بەقەدەر پێغەمبەر خۆشنەوێ)، وە کە کەسێکی خۆشویست تەنیا لەبەر خوا خۆشی بوێ، وە پێی ناخۆشبێ بگەڕێتەوە بۆ کوفر، دوای ئەوەی خوا

دەربازی کردوە لێی، وەك چۆن پێی ناخۆشە فڕێ بدرێتە نێو ئاگر.

**مەسەلەی دەیەم:** کە دەفەرموێ: ﴿إِذْ تَبَرَّأَ الَّذِينَ اتُّبِعُوا مِنَ الَّذِينَ اتَّبَعُوا﴾، واتە: ئەوانەی پەیڕەوییان لێکرابوو حاشیان کرد لەوانەی شوێنیان کەوتبوون، ئەم مەسەلەیە لە زۆر شوێنی دیکەی قورئاندا باسی کراوە، کە ئەوانەی شوێن کەوتوونو ئەوانەی پەیڕەوییان لێکراوە (الأتباع و المتبوعون) حاشا لە یەکدی دەکەن، دیارە پەیڕەویی لێکراوەکان، واتە: سەرکردەو سەرۆکەکان، یەخە دادەدڕنو حاشا دەکەن لە شوێن کەوتووەکانیان، بۆچی؟ چونکە ئەوان گلەییان لێ دەکەنو دەڵێن: ئێمە لە دنیادا لە خزمەت ئێوە دابووینو، کۆیلەو خزمەتکارتان بووینو، ئێوەمان پەرستووەو، ئێوەمان بە هەمەکارەی خۆمان داناوەو، لەبەرخاتری ئێوە خوامان لە خۆمان تووڕە کردوە، پێویستە ئێستا شتێکمان بۆ بکەن، ئەوانیش هیچیان لە دەست نایەتو دەڵێن: ﴿قَالَ الَّذِينَ اسْتَكْبَرُوا إِنَّا كُلٌّ فِيهَا إِنَّ اللَّهَ قَدْ حَكَمَ بَيْنَ الْعِبَادِ ﴿٤٨﴾﴾غافر، واتە: ئەوانەی خۆ بەزلگرن گوتیان: ئێمە هەموومان لە دۆزەخداینو خوا حوکمی لەنێوان بەندەکانیدا کرد{و هیچمان لەدەست نایەت}، وە حاشایان لێ دەکەنو یەخەیان لەبەردا دادەدڕن، جا ئەوە بەڕاستی عیبرەتێکی گەورەی تێدایە بۆ هەموو ئەوانەی غەیری خوا دەپەرستن، وە بۆ هەموو ئەوانەی کە بەرێی غەیری ئیسلامدا دەڕۆنو بەدوای ڕێچکەو بیردۆزەکان دەکەون، بەدوای ڕێچکەی خوارو پیاوی بێ بار دەکەون، کە لە قیامەتێ ئاوا یەخەیان لەبەر دادەدڕنو حاشایان لێ دەکەنو لەبەریان ڕادەکەن، جا لەو حاڵەتەدا شوێنکەوتووەکان هیچیان پێ نامێنێ ئەوە نەبێ کە وەك ئایەتەکە دەفەرموێ، دەڵێن: خۆزگە ئێمەش دەرفەتێکمان لێ هەڵبکەوتایە، جارێك بووباینە سەرکردەو ئەوانە بووبانە شوێن کەوتەمانو، ئێمەش ئاوا حاشامان لێ کردبان ! کە بێگومان ئەوە خەیاڵ پڵاوو خۆزگەو بریایەو قەت بەرینەگرتوەو قەتیش بەرناگرێ.

**مەسەلەی یازدەیەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ كَذَٰلِكَ يُرِيهِمُ ٱللَّهُ أَعْمَٰلَهُمْ حَسَرَٰتٍ عَلَيْهِمْ ﴾، ئاوا خوا کردەوەکانیان نیشان دەدا بۆ ئەوەی بۆیان ببێتە مایەی غەمو پەژارەوە، ئەوەی لێ وەردەگیرێ، کە لە قیامەتێ خوا کردەوەکان بۆ ئینسان بەرجەستە دەکات، چاك بن یان خراپ، کردەوەکانی بە بەرجەستەکراویی دەبینێ، ئەم مەسەلەیەش ئیعجازێکی زانسیی تێدایە، چونکە لە سەردەمێکدا کە قورئان هاتۆتە خوارێ، کەس نەیزانیوە کردەوەکان چۆن ڕۆژی دوایی بەرجەستە دەکرێنەوە؟ بەڵام ئێستا هەر قسەو کردارێك بویستری تۆمار بکرێ، بە کامێرای ڤیدیۆ دەگیرێ، دوایی دەڵێن ئەوە تۆ نی؟ ناتوانی بڵێی نا، وەك دەزگا هەوڵگریی و جاسوسییەکان بەکاری دێنن، کامێرای شێراوە دادەنێن و هەموو حەرەکەو سەکەنەی ئەو کەسە تۆمار دەکرێ و دوایی کە حاشای کرد، دەڵێن: ئا ئەوە نیە تۆی؟! جا ئەوە لە چەند شوێنێك لە قورئاندا ئاماژەی پێدراوە، لێرە دەفەرموێ: ﴿ كَذَٰلِكَ يُرِيهِمُ ٱللَّهُ أَعْمَٰلَهُمْ حَسَرَٰتٍ عَلَيْهِمْ ﴾، واتە: ئاوا کردەوەکانیان دەخەینەوە بەرچاو، وە لە سووڕەتی (الكهف)دا دەفەرموێ: ﴿ ... وَوَجَدُوا۟ مَا عَمِلُوا۟ حَاضِرًا ۗ وَلَا يَظْلِمُ رَبُّكَ أَحَدًا ﴿٤٩﴾ ﴾، واتە: ئەوەی کردبوویان ئامادەبوو، بە ئامادەیی بینییان، وە لە سووڕەتی (الجاثية)دا دەفەرموێ: ﴿ ... إِنَّا كُنَّا نَسْتَنسِخُ مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٢٩﴾ ﴾، واتە: ئێمە نوسخە بەردارییمان لێکرد، فۆتۆکۆپییمان دەکرد ئەوەی ئێوە دەتانکرد. کەواتە: کردەوەکانمان فۆتۆکۆپی دەکرێن، دیارە ئەگەر ئینسان بتوانێ بە کامێرای ڤیدیۆ شت فۆتۆکۆپی بکات، دەبێ فریشتەکان کە خوا بەسەر ئێمەوە کردوونیە چاودێر، چ ئامێرێکی گەشەسەندوویان پێبێ، کە هەموو کردەوەو حەرەکەو سەکەنەی ئێمە تۆمار بکەن !! خوا بە لوتف کەرەمی خۆی سەربەرزی دنیاو دوا ڕۆژمان بکات، ئامین.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی سی و چوارەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان لە ئایەتی (١٦٨ تاكو ١٧٣) دەگرێتە نێوخۆی، واتە: شەش (٦) ئایەت، لەم شەش ئایەتەدا خوا ﷻ بانگی مرۆڤایەتی دەكاتو فەرمانیان پێدەكات كە لەوەی پێیداون لە ڕزقو بژێوی حەلاڵو بەتامو خۆش بخۆن، وە بەدوای هەنگاوەكانی شەیتان نەكەون، وە دوایی پێیان دەفەرموێ: كە شەیتان جگە لە شتی خراپو ناقولا بەهیچ شتێكی دیكە فەرمانیان پێ ناكات. دوایی باسی هەڵوێستی كافرەكان دەكات كە كاتێك بانگ دەكرێن بەدوای بەرنامەی خوا بكەون، پاساو بەوە دێننەوە كە ئەوان هەر بەدوای بابو باپیرانیان دەكەون، جا خوا ﷻ باس دەكات، كە ئایا ئەگەر بابو باپیریان نەفامو نەزانیش بووبن، دەبێ هەر بەدوایان بكەون؟! وە دوایی وێنەیەك دێنێتەوە بۆ ئەوانەی بێبڕوان، وە بۆ كەسێك بانگیان دەكات، وەك چۆن ئینسان كە بانگی ماڵاتو ئاژەڵ دەكات، جگە لە دەنگ هیچیدیكە نافامێو نایبیستێ، ئەوانیش بەو شێوەن، ئنجا دوایی خوا ﷻ بۆ جاری سێیەم لە سووڕەتی (البقرة)دا مسوڵمانان بانگ دەكات بە ناوونیشانی ئیمانو فەرمانیان پێ دەكات كە لەو ڕزقو بژێوە پاكو چاكو بەلەزەتانەی كە پێی داون، بخۆنو سوپاسگوزاریی بۆ خوا بكەن، ئەگەر دەیانەوێ بەندایەتیی بۆ خوا بێننەدی، وە پاشان بۆیان ڕووندەكاتەوە كە خوا ﷻ جگە لە: مردارەوەبووو خوێنو گۆشتی بەرازو ئەوەی بۆ غەیری خوا سەربڕابێ، هیچی دیكەی لێ قەدەغە نەكردوون.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ كُلُواْ مِمَّا فِي ٱلۡأَرۡضِ حَلَٰلٗا طَيِّبٗا وَلَا تَتَّبِعُواْ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيۡطَٰنِۚ إِنَّهُۥ لَكُمۡ عَدُوّٞ مُّبِينٌ ﴿١٦٨﴾ إِنَّمَا يَأۡمُرُكُم بِٱلسُّوٓءِ وَٱلۡفَحۡشَآءِ وَأَن تَقُولُواْ عَلَى ٱللَّهِ مَا لَا تَعۡلَمُونَ ﴿١٦٩﴾

وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ اتَّبِعُوا مَا أَنزَلَ اللَّهُ قَالُوا بَلْ نَتَّبِعُ مَا أَلْفَيْنَا عَلَيْهِ آبَاءَنَا ۗ أَوَلَوْ كَانَ آبَاؤُهُمْ لَا يَعْقِلُونَ شَيْئًا وَلَا يَهْتَدُونَ ﴿١٧٠﴾ وَمَثَلُ الَّذِينَ كَفَرُوا كَمَثَلِ الَّذِي يَنْعِقُ بِمَا لَا يَسْمَعُ إِلَّا دُعَاءً وَنِدَاءً ۚ صُمٌّ بُكْمٌ عُمْيٌ فَهُمْ لَا يَعْقِلُونَ ﴿١٧١﴾ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُلُوا مِن طَيِّبَاتِ مَا رَزَقْنَاكُمْ وَاشْكُرُوا لِلَّهِ إِن كُنتُمْ إِيَّاهُ تَعْبُدُونَ ﴿١٧٢﴾ إِنَّمَا حَرَّمَ عَلَيْكُمُ الْمَيْتَةَ وَالدَّمَ وَلَحْمَ الْخِنزِيرِ وَمَا أُهِلَّ بِهِ لِغَيْرِ اللَّهِ ۖ فَمَنِ اضْطُرَّ غَيْرَ بَاغٍ وَلَا عَادٍ فَلَا إِثْمَ عَلَيْهِ ۚ إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١٧٣﴾ ﴾.

## مانای وشە بە وشەی ئایەتەکان

((ئەی خەڵکینە ! لە هەرچی (بژێوی)، حەڵاڵو خۆش هەیە لە زەویدا بخۆن، وە شوێن پێی شەیتان هەڵمەگرن، دڵنیابن ئەو دوژمنێکی ئاشکراتانە ﴿١٦٨﴾ ئەو تەنیا بە شتی خراپو دزێو فەرمانتان پێدەکات، وە بەوە کە لەبارەی خواوە شتێك بڵێن کە نایزانن ﴿١٦٩﴾ وە ئەگەر پێیان بگوترێ: (واتە: بە کافرەکان) شوێن ئەوە بکەون کە خوا ناردوویەتەخوار، دەڵێن: بەڵکو شوێن ئەوە دەکەوین کە بابو باپیرانمان لەسەری بینیوە، ئەدی ئەگەر بابو باپیرانیان هیچ نەفامنو ڕێی ڕاستیشیان نەگرتبێ ؟! ﴿١٧٠﴾ وە وێنەی ئەوانە کە بێبڕوان، وەك حاڵی کەسێکە کە لە ئاژەڵێکەوە بخوڕێ، بێجگە لە بیستنی دەنگی داواکردنو بانگکردن هیچ حاڵی نابێ ! لاڵن، کەڕن، کوێرن هیچ نافامن ﴿١٧١﴾ ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە ! لەو خواردنە پاكو چاکانەی پێمانداون بخۆن، وە سوپاسی خوا بکەن ئەگەر بەڕاستی دەیپەرستن ﴿١٧٢﴾ بێگومان (خوا) تەنیا مردارو خوێنو گۆشتی بەرازو سەربڕاوی ناوی غەیری خوا لەسەر هێنراوی، لێتان قەدەغە کردوە، هەر کەسێکیش تێگیراو ناچار بوو، وە نە لەڕووی ئارەزووەوە نە زیاد لە پێویستی خوارد، ئەوە گوناهی ناگاتێ (کە لەو چوار قەدەغە کراوەش بخوات) بەڕاستی خوا لێبوردەی بەخشندەیە﴿١٧٣﴾ )) .

## شیکردنەوەی هەندێك لە وشەكان

(حَلَٰلًا)؛ بە كوردی هەر دەڵێین: (حەلاڵ) واتە: ڕەوا، (أَصْلُ الحَلّ: حَلُّ العُقْدَة) (حَل) لە كردنەوەی گرێوە هاتوە (وحَلَلْتُ : نَزَلْتُ) لە زمانی عارەبیدا دەڵێ: (وحَلَلْتُ في المَكَانِ الفُلاَنِيّ)، واتە: لە فلان شوێن دابەزیم لەوێ (وَعَن حَلِّ العُقْدَةِ: حَلَّ الشَّيءُ حَلاَلاً) لە كردنەوەی گرێ، حەلاڵكردن لەوەوە هاتوە، وەك بڵێی حەلاڵكراو، شتێكە كە گرێی قەدەغەكردنی لێ كراوەتەوە.

(طَيِّبًا)؛ واتە: پاكو چاك، ئەوە مانا گشتییەكەیەتی، بەڵام جاری وا هەیە بە مانای خۆشو بەتام دێ، وە جاری وایە بە مانای ئینسانی ڕەوشت بەرز دێ، وە جاری وایە بە مانای زەوی بەپیتو پێز دێ، بەپێی ئەو سیاقانەی كە تێیاندا هاتوە، مانای دەگۆڕێ، (أَصْلُ الطَيِّبِ: مَا تَستَلِذُّهُ النَّفسُ) (الطَيِّب) لە ڕیشەدا بریتیە لە هەرشتێك كە نەفسی ئینسان پێی خۆشبێو حەزی لێ بكات، بۆیە خوا ﷻ وشەی (طَيِّب)ی كردوە بە ئاوەڵناو بە سیفەت بۆ (كَلِم) ﴿...إِلَيۡهِ يَصۡعَدُ ٱلۡكَلِمُ ٱلطَّيِّبُ ... ﴿١٠﴾﴾فاطر، كە مەبەست پێی وشەی یەكتاپەرستیی (لاَ إِلَه إِلاَّ الله)یە، وە وشەی (طَيِّب)ی كردوە بە سیفەت بۆ ڕزقی بەتامو چێژ ﴿كُلُواْ مِمَّا فِي ٱلۡأَرۡضِ حَلَٰلًا طَيِّبًا﴾، هەروەها بۆ ئافرەتانی داوێن پاكو بۆ پیاوانی داوێن پاك: ﴿... وَٱلطَّيِّبَٰتُ لِلطَّيِّبِينَ وَٱلطَّيِّبُونَ لِلطَّيِّبَٰتِ ... ﴿٢٦﴾﴾ النور، هەروەها كردوویەتی بە وەسف بۆ جێگەو ڕێگەی خۆش: ﴿وَمَسَٰكِنَ طَيِّبَةً ... ﴿٧٢﴾﴾ الأعراف، هەروەها بۆ زەوی بەپیتو بەپێز: ﴿وَٱلۡبَلَدُ ٱلطَّيِّبُ ... ﴿٥٨﴾﴾الأعراف، وە بۆ ئەو ئیماندارانەی لە دوارۆژدا دەچنە بەهەشت، كە فریشتەكان پێیان دەڵێن: ﴿... وَقَالَ لَهُمۡ خَزَنَتُهَا سَلَٰمٌ

عَلَيْكُمْ طِبْتُمْ فَادْخُلُوهَا خَالِدِينَ ﴿٧٣﴾ ﴾ الزمر، واتە: ئێوە پاكو چاكن، وە ئەو ئیماندارانەی كە فریشتەكان گیانیان دەكێشن: ﴿ الَّذِينَ تَتَوَفَّاهُمُ الْمَلَائِكَةُ طَيِّبِينَ يَقُولُونَ سَلَامٌ عَلَيْكُمُ ادْخُلُوا الْجَنَّةَ بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٣٢﴾ ﴾ النحل، چونكە بە پاك وچاكیی گیانیان تەسلیمی خوا دەكەنەوە.

(خُطُوَاتِ)؛ (الخُطوَة: مَرّةً مِن خَطى يَخْطو)، (خَطى) واتە: هەنگاوی نا (یخطو) هەنگاو دەنێ (خطوَة) بریتیە لەو هەنگاوەی ئینسان هەڵی دەهێنێت وە نێوان دوو پێیان، كە تۆ هەنگاو دەنێی مەسافەكەی نێوانی پێی دەڵێن: (خُطوَة)، ﴿ ...وَلَا تَتَّبِعُوا خُطُوَاتِ الشَّيْطَانِ... ﴿١٦٨﴾ ﴾ البقـرة، (أي: لا تتبعوهُ)، واتە: بە شوێن شەیتاندا مەڕۆن‌و، بەدوای شەیتان مەكەون.

(بِالسُّوءِ)؛ (السوءُ: كُلُّ مَايَغُمُّ الإنسَانَ مِنَ الأمُورِ الدُّنيَويّة والأُخْرَويَةِ، ومِنَ الأحْوَالِ النَّفْسِيَّةِ والبَدَنِيَّة ... إلخ)، واتە: (سوءُ) هەر شتێكە كە ئینسان پێی خەفەتباربێ‌و پێی ناڕەحەت بێ لە كاروباری دنیایی‌و دواڕۆژیی، وە لە حاڵەتی دەروونیی‌و لە حاڵەتی جەستەیی ... هتد.

(وَالْفَحْشَاءِ)؛ (الفُحْشُ والفَحْشَاءُ والفَاحِشَة: مَاعَظُمَ قُبْحُهُ مِنَ الأفْعَالِ والأقْوَالِ...)، وشەی: (الفُحْشُ والفَحْشَاءُ والفَاحِشَةَ) هەرسێكی، هەرشتێكە كە زۆر ناشیرین بێ لە قسەو كردەوە، هەر كردەوەیەك یان قسەیەكی زۆر ناشیرین‌و ناقۆڵاو دزێو، پێی دەگوترێ: (الفُحْشُ) یان (الفَحْشَاءُ) یان (الفَاحِشَة)، بۆیەش بە زینا دەگوترێ (الفَاحِشَة) لەبەر ئەوەی كردەوەیەكی زۆر ناقۆڵایە، هەروەها ڕژدیی‌و چرووكیی كە خوا دەفەرموێ: شەیتان فەرمانتان پێدەكات بە (الفَحْشَاءُ) بە ڕژدیی‌و چرووكیی، وەك لە سووڕەتی (البقرة)دا هاتوە.

(أَلْفَيْنَا)؛ (أي: وَجَدْنَا) واتە: بینیمان، وەك دەفەرموێ: ﴿ ... وَأَلْفَيَا سَيِّدَهَا لَدَا ٱلْبَابِ ... ﴿٢٥﴾ ﴾يوسف، واتە: یوسفو ئەو ئافرەتەی كە داوای لێكرد كاری خراپی لەگەڵ بكات، كاتێك كە چوونە دەر لە ماڵ، لە دەرگا تووشی گەورەی ئافرەتەكە بوون، واتە: تووشی مێردەكەی بوون.

(يَنْعِقُ)؛ (النَعْق: صَوْت الرَّاعِي)، واتە: دەنگی شوان یان گاوان كە لە وڵاخێكەوە یان ئاژەڵێكەوە دەخوڕێ، دەگوترێ: (نَعَقَ ، يَنعِقُ) بانگی كرد، تێوەی خوڕی، تێوی دەخوڕێ.

(وَمَآ أُهِلَّ بِهِۦ لِغَيْرِ ٱللَّهِ)؛ (الإهلالُ: رَفْعُ الصَّوْتِ)، (أَهَلَّ): واتە دەنگی بەرزكردەوە، لەوەوە هاتوە كە كاتی خۆی مانگی یەك شەوە (هِلاَل)یان بینیوە، گوتوویانە: (هَذَا هِلاَلٌ) لەوەوە بەهەر دەنگ بەرزكردنەوەیەكیان گوتوە: (إهْلاَل)، ﴿ وَمَآ أُهِلَّ بِهِۦ لِغَيْرِ ٱللَّهِ ﴾، واتە: شتێك كە دەنگی پێ بەرزكرابێتەوەو كاتێ كە سەربڕاوە، ناوی غەیری خوای لەسەر هاتبێ.

(ٱضْطُرَّ)؛ واتە: ناچار كراوە، (الإضْطِرَارُ: حَمْلُ الإنسَانِ عَلَى مَا يَضرُّهُ سواءً كَانَ بِسَبَب خَارج أو دَاخِل)، (إضْطِرَار) بریتیە لەوەی كە ئینسان شتێك بكات كە پێی ناخۆشبێ، چ بە هۆیەكی دەرەكیی وەك: لێدان، ترساندن، یان بە هۆیەكی نێوەخۆیی ناچار بكرێ، وەك: تێنوێتی، برسیەتی، كەم خەویی، تینی بۆ بێنێ ئەوەش هەر پێی دەگوترێ (إضْطِرَارُ).

(غَيْرَ بَاغٍ)؛ واتە: بە ئارەزووەوە نەبێ‌و داوای ئارەزووو لەزەت نەكات لەو شتە قەدەغەكراوەدا، كە دەیخوات.

(وَلَا عَادٍ)؛ (العَدْوُ: التَّجَاوُزُ ومُنَافَاةُ الإلْتِئَام) لە سنووریش تێنەپەڕێنێ، حەسەنی بەسریی (ڕەحمەتی خوای لێبێ)، ﴿ غَيْرَ بَاغٍ وَلَا عَادٍ ﴾، وا پێناسە كردوە دەڵێ: (غَيرَ متناول لِلّذَّة ولاَ متَجَاوز سد الجُوعَة) ئەوەیە كە

لەبەر ئارەزوومەندیی ئەو چوار قەدەغەکراوە (مردارەوەبووو خوێن‌و گۆشتی بەرازو بۆ غەیری خوا سەربڕاو) نەخوات، لەبەر ئەوەی کە ئارەزووی لێیە، وە کە خواردیشی لەو ئەندازەیەی کە پشتی پێوە ڕادەوەستێ‌و برسیەتی پێ دەشکێ، لەو ئەندازەیە تێنەپەڕێنێ.

## هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتەکان

هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتەیەی، کە دەفەرموێ: ﴿ يَا أَيُّهَا النَّاسُ كُلُوا مِمَّا فِي الْأَرْضِ حَلَالًا طَيِّبًا وَلَا تَتَّبِعُوا خُطُوَاتِ الشَّيْطَانِ إِنَّهُ لَكُمْ عَدُوٌّ مُبِينٌ ﴾، {(قَالَ الكَلبِي (عَنْ أبي صَالح): نَزَلَتْ في ثَقِيف، وَخُزَاعَةَ، وَعَامر بن صَعْصَعَة حَرَّموا عَلَى أَنفُسِهِم مِنَ الحَرْث والأنعَام، وَحَرَّمُوا البَحِيرَةَ والسَائِبَة والوَصِيلَةَ والحَامِيَ) (أسباب النزول للنيسابوري، ص: (٣٢)}، واتە: کەلبیی دەڵێ: ئەم ئایەتە هاتە خوار دەربارەی (ثَقِيف، وَخُزَاعَةَ، وَعَامر بن صَعْصَعَة) کە سێ تیرە بوون لە تیرەو هۆزەکانی عەرەب، کۆمەڵێ شتیان لە خۆیان قەدەغە کردبوو لە کشتوکاڵ‌و ئاژەڵ، وە چوار جۆرە ئاژەڵیان لە خۆیان قەدەغە کردبوو کە بریتین لە: (بَحِيرَة وسَائِبَة ووَصِيلَةَ وحَامِي)، کە لە دەرسەکانی داهاتوودا ئەگەر خوا تەمەن بدا باسیان دەکەین، لەوبارەوە ئەم ئایەتە هاتە خوارێ کە دەفەرموێ: ئەی خەڵکینە! لەوەی کە حەڵاڵەو پاک‌و چاکە بخۆن، وە بەدوای هەنگاوەکانی شەیتان مەکەون (هەر بە ئارەزووی خۆتان هەندێ شتان لە خۆتان حەرام بکەن، ئەوە شوێن شەیتان کەوتنە، یاخود شتێك کە خوا حەرامی کردوە بۆ خۆتانی ڕەوا مەکەن، یان شتی پیس‌و زیانبەخش مەخۆن).

## مانـــای گشـــتی ئایەتەکـــان

خوا ﷻ پاش ئەوەی لە ئایەتەکانی ڕابردوودا باسی پەرستـراوێتی خـۆی کـرد، کە تـەنیا ئـەو پەرستـراوە، وە دوای ئـەوەی باسـی پەروەردگـارێتی خـۆی کـرد، وە پاشان باسی سـەرەنجامی ئەوانەی کرد لە غـەیری خـوا دەپەرسـتن و، غـەیری خـوا بە پەروەردگاری خۆیان دەزانـن، کـە لـە دوارۆژدا تووشـی چ سـەرەنجامێکی ڕەش و تاریـك و خـراپ دەبـن، ئنجـا وەك پەروەردگـارو بەدیهێنـەری ئـەو خەڵکـە فەرمانیـان پـێ دەکـات کـە ئـەو سـفرەیەی کـە بـۆی ڕازاندوونـەوە لـە زەوی و ئـەو هـەموو ڕزق و ڕۆزییـە حـەڵاڵ و پـاك و چاکـانەی لەسـەرن، لێـی بخـۆن. ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ كُلُواْ مِمَّا فِي ٱلۡأَرۡضِ حَلَٰلٗا طَيِّبٗا ﴾، ئـەی خەڵکینـە! لـەوەی لـە زەوی دایـە هەرچی لە زەوی دایە مادام حەڵاڵ و خۆش و بەتـام (طَيِّب) بێ، لـێی بخۆن، حـەڵاڵ واتـە: بەشـێوەیەکی ناشـەرعیی دەسـتتان نەکـەوتبێ و، (طَيِّـب) واتــە: لــە زاتـی خۆیدا پـاك و چاك و خۆشـبێ و سـوودبەخش بـێ و زیانبـەخش نـەبێ ﴿ وَلَا تَتَّبِعُواْ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيۡطَٰنِۚ إِنَّهُۥ لَكُمۡ عَدُوّٞ مُّبِينٌ ﴾، وە بـــەدوای هەنگـــاوەکانی شـــەیتان مەکەون، کە لەخۆوە شتێك لە خۆتـان قەدەغـە بکـەن، هـەر بـە بیـرکردنەوەیەکی ئەفسانەو شوێنکەوتنی کوێرانـەی پێشینانتان، شـتێکی چـاك و پـاك لەخۆتـــان قەدەغە بکـەن، ئەوە شـوێن پـێ شـەیتان هەڵگرتنە، هەروەها شـتێکیش کە خوا بە حەرامی دانـاوەو پیس و زیان بەخشـە، دیسـان بـەهۆی شـوێن کـەوتنی شـەیتانەوە بۆ خۆتانی حەڵاڵ مەکـەن، وەك گۆشتی بەرازو خوێن و مردارەوەبووو ناوی غەیری خوا لەسـەر هێنراو، لەکاتی سـەربڕاندا، ﴿ إِنَّهُۥ لَكُمۡ عَدُوّٞ مُّبِينٌ ﴾، بێگومان شەیتان بـۆ ئێـوە دوژمنێکـی ئاشـکرایە، واتــە: هـەم دوژمنـە، هـەم دوژمنایەتییەکـەشی ئاشـکرایە، چونکە جاری وایە تۆ کەسێك دوژمنایەتییت دەکات، بەڵام بە پەنهانیی، شـەیتان دوژمنایەتییمان دەکـات، بە ئاشـکراو بێ پێـچ و پەنـا کە ئەوە دیارە خۆی

گوتوویـــەتی: خوایــە بمـــهێڵەوە تـــا قیامـــەتێ ﴿ ... لَئِنْ أَخَّرْتَنِ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَـٰمَةِ لَأَحْتَنِكَنَّ ذُرِّيَّتَهُۥٓ إِلَّا قَلِيلًا ﴿٦٢﴾ ﴾الإســـراء، واتــە: ئەگــەر بمهێڵــیەوە تـا ڕۆژی قیامەتێ، جگــە لە كەمێك ئەگــەرنا وەچەی ئــادەم وا لێدەكەم كە هیچی بەقسەی تۆ نەكـات، مانای وایە ئـەوە گـەورەترین دوژمنایەتییە، ئنجا دوژمنایەتییەكەشی ئاشـكرایەو بۆخـۆی ڕایگەیانـدوە، واتــە: شـەیتان ئیعلانــی جـەنگی لەگـەڵ ئێــوەدا كردوەو ئیعلانـی دوژمنایەتیی لەگەڵ ئێوەدا كـردوە، ئێوەش ســەنگەری لێبگـرنو بەدوای مەكـەونو بـە قـسەی مەكـەنو، بـەدوای هـەنگاوەكانی مەكـەون، ئنجا ئایـا ئەگەر بەدوای شەیتان بكەوین چیمان بۆ دەكات؟ دەفەرموێ: ﴿ إِنَّمَا يَأْمُرُكُم بِٱلسُّوٓءِ وَٱلْفَحْشَآءِ وَأَن تَقُولُوا۟ عَلَى ٱللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴾، (إِنَّمَا) وەك پێـــشتـر گوتوومانــــە: ئـامرازی چەسـپاندنو كـورت هەڵهێنانــە (أداة الحـصر والإثبـات) دەچـێتە ســەر هەرشتێك، حوكمەكەی بۆ دەچەسپێنێ، وە لەوێشـدا كورتی هەڵدێنـێ ﴿ إِنَّمَا يَأْمُرُكُم بِٱلسُّوٓءِ وَٱلْفَحْشَآءِ ﴾، بێگومان شەیتان تەنیا فەرمانتان پێدەكـات بـە شتی خـراپ، وە بە شتی درێوو ناقۆلا، ﴿ وَأَن تَقُولُوا۟ عَلَى ٱللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴾، وە فـەرمانتان بـەوە پێدەكـات لەبارەی خـواوە شـتێك بڵێن كە زانیارییتان پێی نیـە، لـەخۆوە ناوێـك لـە خوا هـەڵدەنو سیفەتێكی بۆ بەكـاربێنن، یان بەشێوەیەك بیپەرسـتن هاوبەشـی بـۆ پەیدابكەن، یاخود هەر لە خۆوە بەنــاوی خـواوە بڵــێن: فـلانە شـتە حەلاڵـــە یـان حەرامــە، ئـەوە هـەمووی پـیلانو فێڵـی شـەیتانو وەسـوەســەی شـەیتانە، كەواتــە: ئــەوەی شـەیتان لێمــانی دەوێ: قـسەی خـراپو كـردەوەی خـراپو بیـركردنەوەی خراپو، قسەی ناشیرینو كردەوەی ناشـیرینو هەڵوێستی ناشـیرینە، وە ئـەوە كـە شتێك بەناوی خوا بـڵێـن كە ڕاسـت نیــەو زانیارییـمان لـەبارەیـەوە نیـە كـە خـــوا وایـفەرمــووە. ﴿ وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ ٱتَّبِعُوا۟ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ ﴾، ئنجـا باسـی شـوێن كـەوتووانی شەیتان دەكاتو دەفەرموێ: وە ئەگـەر پێیان بگـوترێ: بەدوای ئەوە بكەون كە خوا

ناردوویەتە خوار، کافرەکان، کۆمەڵی شەیتانو پەیڕەوانی شەیتانو شوێنکەوتووانی شەیتان، ئەگەر پێیان بگوترێ: بەدوای ئەوە بکەون کە خوا ناردوویەتە خوار واتە: کتێبو بەرنامەی خوا، ﴿قَالُواْ بَلْ نَتَّبِعُ مَآ أَلْفَيْنَا عَلَيْهِ ءَابَآءَنَآ﴾، دەڵێن: بەڵکو ئێمە بەدوای ئەوە دەکەوین کە بابو باپیرانی خۆمانمان لەسەر بینیوە. واتە: بەدوای شتێك دەکەوین کە بابو باپیرانمان، پێشینانمان لەسەری ڕۆیشتوون، خوا ﷻ پرسیارێکیان لێ دەکات کە وەڵامەکەی لەنێوخۆی دایەو ئەوە پێی دەگوترێ: (الإستفهام الإنكاري)، واتە: پرسیارکردنێکی نکوولیی لێکەرانە، ﴿أَوَلَوْ كَانَ ءَابَآؤُهُمْ لَا يَعْقِلُونَ شَيْـًٔا وَلَا يَهْتَدُونَ﴾، دەفەرموێ: ئەدی ئەگەر بابو باپیرانیشیان لەسەر نەفامیی بووبن، وە ڕێی ڕاستیان نەگرتبێ؟ واتە: هەر بەدوایان دەکەون ئەگەر نەفامو نەزانیش بوون؟! لێرەدا ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کە تۆ ئەگەر بە دوای بابو باپیرانت بکەوی لەسەر شتی چاك، باشە، بەڵام لەسەر شتی غەڵەتو پەڵەت، ئەوان کە بۆخۆیان بەهەڵەداچوون، تۆ بۆچی ڕیشی خۆت لە مست کەسێك دەنێی، کە بۆخۆی بەرێیە نازانێ؟ بۆخۆی چاکی نەکردوە تا تۆ فێری چاکە بکات؟ ئنجا خوا ﷻ وێنەیەکیان بۆ دێنێتەوەو وێنایان دەکات لە دیمەنێکدا: ﴿وَمَثَلُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ كَمَثَلِ ٱلَّذِى يَنْعِقُ بِمَا لَا يَسْمَعُ إِلَّا دُعَآءً وَنِدَآءً﴾، وە وێنەی ئەوانەی بێبڕوان، وەك وێنەی کەسێك وایە کە لە ئاژەڵێکەوە دەخوڕێ، کە جگە لە داواکردنو بانگکردن، واتە: جگە لە دەنگەکە هیچی دیکە حاڵی نابێ، ﴿صُمٌّۢ بُكْمٌ عُمْىٌ﴾، ئەو بێبڕوایانە کەڕن لاڵن کوێرن. (صُمٌّ) کۆی (أصَم)ە، واتە: کەڕ. (بُكْمٌ) کۆی (أبكم)ە، واتە: لاڵ، (عُمْىٌ) کۆی (أعمَى)یە واتە: کوێر ﴿فَهُمْ لَا يَعْقِلُونَ﴾، بۆیە نافامن، کەسێك نەبیستێو نەبینێو ئنجا زمانێکی فەصیحی نەبێ قسە لەگەڵ خەڵکیدا بکات، بە تەئکید لە بێعەقڵیی و نەفامییدا دەمێنێتەوە، ئنجا دوای ئەوە خوای پەروەردگار بانگی مرۆڤایەتی کرد بەگشتی،

دەفەرموێ: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ﴾، ئەمجارە بانگی ئیمانداران دەکات بەتایبەت، ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە! ﴿ كُلُواْ مِن طَيِّبَـٰتِ مَا رَزَقْنَـٰكُمْ وَٱشْكُرُواْ لِلَّهِ إِن كُنتُمْ إِيَّاهُ تَعْبُدُونَ ﴾، لەو ڕۆزییە پاكو چاكو بەلەزەتو خۆشانە بخۆن كە پێمانداون، وە سوپاسی خوا بكەن، ئەگەر بەڕاستی ئەو دەپەرستن، ئنجا بۆیان ڕووندەكاتەوە كە چی لێ قەدەغەكردوون بۆئەوەی هەر كەسێ ڕاست بۆوە لەخۆڕا بازنەی قەدەغەكراوەكان فراوان نەكات، چونكە خوا زۆری پێ ناخۆشە ئەو شتانەی كە بۆ بەندەكانی خولقاندوونو بۆی موباح كردوون، وە هیچ زەرەرو زیانێكیان لێ نادات، یەكێ هەر لەخۆوە لە بەندەكانی حەرامیان بكات، هەروەك چۆنی پێ ناخۆشە ئەو شتانەی كە لێی قەدەغە كردوون، یەكێك بێ لەخۆڕا بۆیان ڕەوا (حلال) بكات، كە زیانیشی تێدایە بۆیان، دیسان ئەگەر شتێكیش كە حەڵاڵی كردوەو موباحی كردوە، یەكێك بەناوی دینەوە بە بیانووی تەقواوەبێ لێیان قەدەغە بكات، زۆری پێ ناخۆشە، بۆیە دەفەرموێ: ﴿ إِنَّمَا حَرَّمَ عَلَيْكُمُ ٱلْمَيْتَةَ وَٱلدَّمَ وَلَحْمَ ٱلْخِنزِيرِ وَمَآ أُهِلَّ بِهِۦ لِغَيْرِ ٱللَّهِ ﴾، بێگومان خوا تەنیا مرداری لێ قەدەغە كردوون، وە خوێن، وە گۆشتی بەراز، وە ئەوەی دەنگی لەسەر بەرزكرابێتەوە بۆ غەیری خوا، واتە: ناوی غەیری خوای لەسەر هاتبێو بۆ غەیری خوا سەربڕابێ، هەر ئەو چوارەی لێ قەدەغە كردوون، ئنجا ئەو چوارەش ﴿ فَمَنِ ٱضْطُرَّ غَيْرَ بَاغٍ وَلَا عَادٍ ﴾، كەسێك سەغڵەت كرا ناچار بوو بە مەرجێك بە ئارەزووەوە نەبێ، لەبەر ئارەزوو لێبوون لەو شتە قەدەغە كراوانە نەخوات، وە لە ئەندازەی پێویستیش تێنەپەڕێنێ، ﴿ فَلَآ إِثْمَ عَلَيْهِ ﴾، ئەوە بەنسبەت ئەو چوارانەشەوە دیسان گوناهبار نابێ، ئەگەر لەكاتی ناچارییو تێكگیراوییدا لێیان بخوات ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴾، بێگومان خوا لێبووردەی بەخشندەیە.

## چەنـد مەسـەلەیەکـی گرنـگ

**مەسـەلەی یەکـەم:** کـە خـوا پـەروەردگار دەفـەرموێ: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ كُلُواْ مِمَّا فِى ٱلْأَرْضِ حَلَـٰلًا طَيِّبًا ﴾، لێی وەردەگیـرێ کە هەرچی لـە زەوی دایـە، لـەو ڕزقو ڕۆزییانەی کە پەیدا دەبن هەمووی موبـاحو ڕەوایە، بە دوو مەرج:

١- بەرێیەکی حـەڵاڵ بەدەسـت هاتبێ لـە ڕووی شـەرعییەوە، بـەدزیی نەبـێ، بە غەصب نەبێ، بە فـرتوفێـڵ نەبـێ، ئەوە لە ڕووە شەرعییەکەیەوە.

٢- لە ڕووی تەندروستییشـەوە، پـاكو چـاكو بەلـەزەتو خۆشـبێو بەسـوودبێ بۆ جەسـتەو زیـانی نەبێت.

**مەسـەلەی دووەم:** بنـچینە ڕەوایـی یـە لـە شتەکـاندا، وەك زانایـان گوتـوویانە: (الأَصْلُ فـي الأَشْيَاءِ الإِبَاحَة) بنچینە لە شـتەکاندا بریتیـە لـە ڕەوایی، هـەموو شـتێك ڕەوایـە مەگـەر بەڵگـە هـەبێ لەسـەر ئـەوەی کـە فـلانە شـتە، شـەرع هەڵێـواردوەو، جیای کـردۆتەوەو، قەدەغـەی کردوە.

**مەسـەلەی سێیەم:** کـە دەفـەرموێ: ﴿ وَلَا تَتَّبِعُواْ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيْطَـٰنِ ﴾، ئـەوەی لـێ وەردەگیـرێ کـە شـەیتان دوو شـتان دەکـات یـان ئـەوەتا شـتێك کـە خـوا بـۆ بەنـدەکانی ڕەوای کـردوە، لێیـان قەدەغـەدەکات، یـان ئـەوەتا خـوا شـتێك کـە لـە بەندەکانی قەدەغـەکردوە لەبـەر ئـەوەی زیانیـان لێدەدا، دێنێـت لـە بەرچاویان شیرین دەکاتو جوانی دەکات بۆ ئەوەی بەکاری بێـنن، لـە حاڵێکدا کـە خـوا لێی قەدەغـەکردوون، واتـە: شـەیتان لـە بـواری خواردنەکانـدا دوو شـتان دەکـات: هەرکەسێك بـەدوای هـەنگاوەکانی بکـەوێ، یـان ئـەوەتا شـتێك کـە خـوا حەڵاڵـی کـردوەو ڕەوای کـردوە، لە خـۆی قەدەغەی دەکـات، یـان ئـەوەتا شـتێك کـە خـوا لـێی قەدەغەکردوە بۆ خـۆی موبـاحی دەکـاتو ڕەوای دەکات، کـە لـە هـەردووك حـاڵەندا گونـاحبار دەبێو زەرەرمەندیش دەبێ، بەنـسبەت لای خواو بۆ قیـامەت گونـاحبـارەو، بۆ دنیایەش زەرەرمەند دەبێت، چونکە بـە تەئکـید هەر شـتێك

كە خوا قەدەغـەی كردوە دیارە زیانی تێدایە، زیـانی بـۆ عـەقڵ‌و بـۆ ڕووح‌و بـۆ جەسـتە، لە هەموو ڕووێكەوە زیانی تێدایەو ئەگەر بەكاری بێنـێ لێـی تووشـی زەرەر دەبـێ، وە شـتێكیش كـە خـوا حەڵاڵـی كـردوە، دیـارە سـوودی تێدایــەو وەختـێ لـە خـۆتی دەگریــەوەو، لـە خـۆتی قەدەغەدەكـەی مانـای وایـە خـۆت مەحـرووم كـردوە لـە خێرێـك كـە خـوا دروسـتی كـردوە لـێی بەهرەمەنـدبی، ئەگەر بەكـاری بهێنـی.

**مەسـەلەی چوارەم:** كە دەفەرموێ: ﴿ إِنَّمَا يَأْمُرُكُم بِٱلسُّوٓءِ وَٱلْفَحْشَآءِ وَأَن تَقُولُواْ عَلَى ٱللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴾، ئەمە ئـەوەی لـێ وەردەگیـرێ كـە هەركەسێك بـەدوای شـەیتان كـەوت، جگـە لـە قـسەی خـراپ‌و كـردەوەی خـراپ‌و، جگـە لـە قـسە ناشیـرین‌و كـردەوەی ناشیـرین، وە جگـە لـەوە كـە شـتانێك بڵـێ، كـە خـوا نەیفـەرمووبن، جگە لەوە ڕێی لە هیچیدیكـە ناكـەوێ، وە لە واقیعدا هەر وایە تەماشا بكەن: ئەوانەی كـە بـەدوای شـەریعەت ناكـەون هەمیـشـە بـەش‌و نـسیبیان بریتیـە لـە قـسـەی خـراپ‌و قـسـەی ناشـیـرین‌و كـردەوەی ناشـیـرین وە مامەڵـەكردنێكی نەزانانەو نەفامانە لەگەڵ خوای پەروەردگارو بەندەكـانیدا.

**مەسـەلەی پێنجەم:** یـەكێك لـە ڕەوشـتە بنـچینەییەكانی ئەهلـی كوفر بریتیـە لـە لاساییكردنەوەی كوێرانەی پێشینان، بۆیە زانایانی ئیسلام گوتوویانـە: مـسوڵمان دەبـێ زۆر ئاگـای لێبـێ، هەمیـشە لـە دینداریـیداو بـە تایبـەتی لـە مەسـەلەی ئیمـان‌و عەقیــدەدا، نابــێ لاسـایی كـەس بكاتــەوەو دروسـت نیـە لاســاكەرەوە (مُقَلِّد) بێت، بەڵكو دەبێت بـۆ خـۆی هەوڵــبداو تێبگــات‌و شارەزا بـێ، وە لـە بواری فیقهیی‌و ئەحكـامی كردەوەییشدا دەبێ لەویـشدا بـەپێی توانا هەوڵبـدا بزانــێ خــوا ئــەو شـتەی چـۆن حــەڵاڵ كـردوەو یـان بۆچـی حـەرامی كـردوە؟ هەوڵبدا بۆخۆی لێی تێبگـات، ئەوەی نەیتوانی، ئنجـا لە زانایان بپرسـێ، بۆیـە لاساییكردنەوە (تقلید) لـە ئیـسلامدا شـتێكی خراپـە، چونكە عادەتی كـافرو خوا نەناسانە، وە لەڕاسـتیدا ئـەم ئایەتـە ئەوەشـی لێوەردەگیـرێ، كـە ئینـسانی مـسوڵمان‌و دینـدار بـەوە لـە خـەڵكی دیكـە جیادەكرێتـەوە، كـە عـەقڵی خـۆی

بەکاردێنی، بەڵام خەڵکی دیکە بە زۆری وایە وەك مەڕ دەکەونە دوای یەك و سەر لە دوو یەك دەنێن و ئەهلی تەقلیدن، ئەهلی کوفر بەزۆری وان.

**مەسەلەی شەشەم:** خوا لە باسی شوێن کەوتن و تەقلیدکردنی و کوێرانەی باب و باپیرانیاندا دەفەرموێ: ﴿أَوَلَوْ كَانَ ءَابَآؤُهُمْ لَا يَعْقِلُونَ شَيْـًٔا وَلَا يَهْتَدُونَ﴾، ئایا ئەگەر باب و باپیرانیشیان هیچیان نەفامیبێ، وە بە ڕێشیان نەزانیبێ، هەر بەدوایان دەکەون؟! ئەمەش ئەوەی لێوەردەگیرێ، کە پێشینانی صالح و عاقل و ڕێی ڕاستگرتوو، ئەگەر ئینسان بیانکاتە سەر مەشق زۆر باشە، بەڵام بەبیانووی ئەوەی کە پێشینان باب و باپیرانی تۆن، بێنی هەر بەدوایان بکەوی، بێ ئەوەی کە بە ڕێی ڕاستیشیان زانیبێ و، بەبێ ئەوەی کە شتەکەیان مەعقوول و چاك بێت، ئەوە بە تەئکید شتێکی هەڵە و خراپە.

**مەسەلەی حەوتەم:** کە خوا ﷻ بانگی ئیمانداران دەکات دەفەرموێ: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ كُلُوا۟ مِن طَيِّبَـٰتِ مَا رَزَقْنَـٰكُمْ﴾، ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! لەو بژیوە پاك و چاکانەی پێمان داون بخۆن، بۆچی وشەی حەڵاڵی بەکارنەهێناوە؟ چونکە ئیمانداران بنچینە وایە کە غەیری حەڵاڵ ناخۆن، ئەدی بۆچی وشەی (طَيِّبات)ی بەکارهێناوە؟ واتە: ئەو شتانەی کە سوودبەخشن و بەتام و چێژن؟ چونکە لێرەدا وەك نیعمەتێك خوای پەروەردگار دەیخاتە بەرچاویان، کە ئەو ڕزق و ڕۆزییە بەتام و بەلەزەتانەی، وەك نیعمەتێك خوا پێی داون، لێیان بخۆن و بەهرەمەندبن ﴿وَٱشْكُرُوا۟ لِلَّهِ إِن كُنتُمْ إِيَّاهُ تَعْبُدُونَ﴾، واتە: وە ئەگەر بەڕاستی خوا دەپەرستن سوپاسگوزاری بن لەسەر چاکە و نیعمەتەکانی.

**مەسەلەی هەشتەم:** کە خوای بەخشەر دەفەرموێ: ﴿وَٱشْكُرُوا۟ لِلَّهِ إِن كُنتُمْ إِيَّاهُ تَعْبُدُونَ﴾، واتە: سوپاسی خوا بکەن، ئەگەر بەڕاستی ئەو

دەپەرستن‌و، ئەگەر تەنیا ئەو دەپەرستن، ئەمە ئەوەی لێوەردەگیرێ کە طاعەت‌و خوا پەرستیی وا لە ئینسان دەکات سوپاسگوزاربێ، یاخود بەهۆی سوپاسگوزارییەوە ئینسان دەبێتە خواپەرست، وە لەڕاستیدا ئەو دوو شتە شوکرو عیبادەت هەردووکیان تێکهەڵکێشن، چونکە کەسێك بەڕاستی خواپەرست بێ، خواپەرستێتی پاڵی پێوە دەنێ کە سوپاسگوزاربێ بۆ خواو سپڵەو بێ نمەك‌و بێ وەفا نەبێ، وە کەسێکیش بیەوێ سوپاسگوزاربێ بۆ خوا، دەبێ خواپەرستیی‌و بەندایەتیی بۆ خوا بکات.

**مەسەلەی نۆیەم:** کە دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا حَرَّمَ عَلَيْكُمُ الْمَيْتَةَ وَالدَّمَ وَلَحْمَ الْخِنزِيرِ وَمَا أُهِلَّ بِهِ لِغَيْرِ اللَّهِ فَمَنِ اضْطُرَّ غَيْرَ بَاغٍ وَلَا عَادٍ فَلَا إِثْمَ عَلَيْهِ إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾، ئەم ئایەتە لە چوار شوێنی قورئاندا هاتوە شوێنی یەکەمیان ئەم ئایەتەیە، شوێنی دووەمیان لە سووڕەتی (الأنعام) ئایەتی (١٤٥) دایە، دەفەرموێ: ﴿قُل لَّا أَجِدُ فِي مَا أُوحِيَ إِلَيَّ مُحَرَّمًا عَلَىٰ طَاعِمٍ يَطْعَمُهُ إِلَّا أَن يَكُونَ مَيْتَةً أَوْ دَمًا مَّسْفُوحًا أَوْ لَحْمَ خِنزِيرٍ فَإِنَّهُ رِجْسٌ أَوْ فِسْقًا أُهِلَّ لِغَيْرِ اللَّهِ بِهِ فَمَنِ اضْطُرَّ غَيْرَ بَاغٍ وَلَا عَادٍ فَإِنَّ رَبَّكَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾، کە هەمان شێوەی ئێرەی هەیە لەگەڵ هەندێ جیاوازی، شوێنی سێیەم لە سووڕەتی (النحل) ئایەتی (١١٥) دایە، کە دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا حَرَّمَ عَلَيْكُمُ الْمَيْتَةَ وَالدَّمَ وَلَحْمَ الْخِنزِيرِ وَمَا أُهِلَّ لِغَيْرِ اللَّهِ بِهِ فَمَنِ اضْطُرَّ غَيْرَ بَاغٍ وَلَا عَادٍ فَإِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾، وە شوێنی چوارەمیش لە سووڕەتی (المائدة) ئایەتی ژمارە (٣) دایە، کە دەفەرموێ: ﴿حُرِّمَتْ عَلَيْكُمُ الْمَيْتَةُ وَالدَّمُ وَلَحْمُ الْخِنزِيرِ وَمَا أُهِلَّ لِغَيْرِ اللَّهِ بِهِ ...﴾، ئنجا دوایی چەند شتێکی دیکە دەفەرموێ کە هەموویان دەچنە نێو بازنەی مردارەوە بووەوە، کەواتە: ئەو مەسەلەیە مەسەلەیەکی گرنگەو

خـوا ﷻ یـەك شت لە چوار شوێنی قورئان، لە دوو ئایەتی مەککـەیی، لەگـەڵ دوو ئایـەتی مەدینەییدا باس بکات، دیارە شتێکی گەورەیـەو هەرواشـە، چونکە بەشـێکی زۆری لادان (إنحـراف) لـە ژیـانی بەشـەردا لـە مەسـەلەی خـواردنو خواردنـەوە دایـە، وە زۆر لـە نەخۆشـیو بـەڵاو گرفتـاریی، بـەهۆی خـواردنو خواردنـەوەی حـەرامو پیسـەوە پەیـدا دەبـن، بەڵـکو زۆر کێشـەو گرفتـاریی سیاسیو کۆمەڵایـەتی بـەهۆی خـواردنو خواردنـەوەوە پەیدا دەبن، ئێسـتا ئـەو هەموو هەراو کێشەیەی لەنێو بەشەردا هەیە لەسەر چییە؟ زۆربـەی هۆکـاری ئـابووری هەیـەو لەسـەر خـواردنو خواردنـەوەو ئەوانەیـە، بۆیـە دیـاریکردنی حـەرامو حـەڵاڵ، دیاریکـردنی ئـەو شـتانەی کـە خـوا بـە ڕەوای دانـاون ئینسـان لێیـان بەهرەمەنـد بـێ، وە ئـەو شـتانەی کـە خـوا قەدەغـەی کـردوون، ئـەوە بەراستی مەسـەلەیەکی گرنگـە، بۆیە خـوا ﷻ بەپێی سیاقی ئەو ئایەتانـەی کـە تیایاندا دووبـارە بوونەتەوە، لە هەموو ئەو شـوێنانەدا بـە پێویسـتی زانیـوە کـە ئـەم مەسـەلەیە لـەو چوار ئایەتـە بـەپێزەدا دووبـارە بکرێتـەوە، ئێمـەش لێـرە هەوڵـدەدەیـن توێژینەوەیەکی تارادەیـەك تێرو تەسـەلێ لەبارەوە بکەین، تاکو لە شـوێنەکانی دیکـەدا دووبارەی نەکەینـەوە، هەڵبـەتە لەگـەڵ کورتکـردنەوەو گوشـیندا، دەڵێیـن : توێـژەرەوانی قورئـان وە شەرعـزانان بەگشتی دەربـارەی ئـەم ئایەتـە کـە دەفـەرموێ: ﴿ إِنَّمَا حَرَّمَ عَلَيْكُمُ ٱلْمَيْتَةَ وَٱلدَّمَ وَلَحْمَ ٱلْخِنزِيرِ وَمَآ أُهِلَّ بِهِۦ لِغَيْرِ ٱللَّهِ ﴾، لێـرە کـە دەفـەرموێ: ﴿ بِهِۦ لِغَيْرِ ٱللَّهِ ﴾، وە لـە سـێ شـوێنەکانی دیکـەدا دەفـەرموێ: ﴿ لِغَيْرِ ٱللَّهِ بِهِۦ ﴾، لێـرە ڕاناوەکـەی پـێش خستوەو، لـەوێ لە هەر سێ شوێنەکـاندا دوای خستوە، ئـەم ڕسـتە قورئانییـە دەفـەرموێ: بێگومـان خـوا تـەنیا مـرداروخـوێنو گۆشـتی بـەرازو سـەربڕاو بـۆ غـەیری خـوای لـێ قەدەغـەکردوون، دیـارە وشـەی: ﴿ إِنَّمَا ﴾، ئـامرازی چەسپاندنو کورت هەڵهێنانـە (أداة الحصر والإثبات) واتـە خـوا ﷻ جگـە لـەو چوارە هیچ شتێکی دیکەی لـێ قەدەغـە نـەکردووین لـە خواردنەکـان، جا ئایـا

ئەمە چۆنە؟ لە حاڵێكدا كە لە هەنـدێك لـە فەرمایـشتەكانی پێغەمبـەر ﷺدا هـاتوە، كە هەر دڕندەیەكی كەڵـبەدار، وە هـەر پەڕەوەرێكـی چڕنووكـدار، واتـە: ئەوەی كە كەڵبەی تیژی هەبێ لە دڕندەكـان، وە ئەوەی كـە چڕنووكو نینـۆكی هــەبێ لــە پــەڕەوەرەكان، ئەوانــەش قەدەغــەكراون، ئەمــەش فەرمایــشتەكەی پێغەمبەر ﷺ: {(إِنَّ اللهَ حَرَّمَ كُلَّ ذِي نَابٍ مِنَ السِّبَاعِ، وَكُلَّ ذِي مِخْلَبٍ مِنَ الطَّيرِ) (أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٢٦١٩)، وَصَحَّحَهُ أَحْمَد شاكر}، واتە: بێگومان خوا هەموو دڕندەیەكی كەڵبەدارو هەموو بـاڵندەیەكی چڕنووكـداری قەدەغـە كـردوە، (السِّبَاعِ): هـەموو دڕندەیـەك كـە: گـورگو چـەقەڵو كـەمتیارو شـێرو پڵنگو ئەوانە دەگرێتـەوە، كـە هـەموویان كـەڵـبەدارن، واتـە: گۆشـت خـۆرن، وە (كُلَّ ذِي مِخْلَبٍ) هـەموو چڕنووكدارێكی باڵـندەكان، وەك: هەڵـۆو خەرتـەڵو بازو باشوو ئەوانە ... بۆیە زانایان كەوتوونە مشتومڕەوە دەربارەی ئەم ئایەتە:

أ/ هەندێكیان دەڵێن: لەبەر ئەوەی خوا لـە چوار ئایـەتانو لـە چـوار شـوێناندا وا دەفەرموێ، كـەواتە: غەیری ئەم چوارە هیـچ خواردنێكی دیكە بە تایبەتـی لـە گۆشت قەدەغە نیە، لەنێو ئەوانـەدا (القُرطُبي) ئـەو ڕایـەی هێنـاوە، وە (ابـن العـربي) خـاوەنی كـتێبی (أحكـام القُـرآن)[1]، وە هەنـدێك دەڵــێن: (إمـام مالـك)یـش ڕای وایـەو بـە چـەند شـێوەیەك لـێی گێڕدراوەتـەوە، كـە دیـارە هـەركام لە (القُرطُبي)و لـە (ابـن العربـي)یـش هـەر مـالیكی مـەزەبن، ئەوانـە دەڵێن: (فَلاَ مُحَرّم خَارج هَذِهِ الآيَةَ)، واتـە: بـەدەر لـەم ئایەتـە هـیچ شـتێكی دیكـە قەدەغـە نیـە، ئـەدی چ لـەو فەرمایـشتانەی پێغەمبـەر ﷺ دەكـەن ؟ دەڵـێن: مەبەسـتی پێغەمبـەر ﷺ لـەو فەرمایـشتانە ئەوەیـە كـە ئـەو شـتانە ناپەسند (مكروه)ن، بەڵام قەدەغە نین بەو واتـایەی كە قورئـان فەرموویـەتی، وە دەشگونجێ بگوترێ: كـە مەبەسـتی پێغەمبـەر ﷺ لێرەدا ئەوەیـە كـە لـە ڕووی پزیـشكی (طُبِّي)یـەوە ئـەو شــتانە قەدەغــەو حـەرامن، واتــە: لەبـەر

١) بڕوانە : (الجامع لأحكام القرآن)، ج: (٢)، ص: (١٩١) .

ئەوەی كە زیان بەخشن، بەڵام بەهەرحاڵ یەكێك بۆی هەیە بڵێ ئەوانی دیكەش هەر لەبەر ئەوە كە زیان بەخشن حەرامن، چونكە خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ ... وَيُحِلُّ لَهُمُ الطَّيِّبَٰتِ وَيُحَرِّمُ عَلَيۡهِمُ الۡخَبَٰٓئِثَ ...(١٥٧) ﴾ الأعراف، واتە: ئەوەی پاكو چاكو سوودبەخشە بۆیان حەڵاڵ دەكات، ئەوەی زیانبەخشە لێیان قەدەغە دەكات، كەواتە: خوا هیچ شتێكی قەدەغە نەكردوە كە زیانبەخش نەبێ.

ب/ زانایانی دیكە كە زۆربەی هەرە زۆری زانایانن دەڵێن: لەڕاستیدا ئەوە وانیە، بەڵكو لێرەدا ئەو حەصرە (الحصر الإضافي) پێ دەڵێن، واتە: بەنسبەت ئەو شتانەی كە كافرەكان لە خۆیانیان قەدەغە كردبوون، هیچیان قەدەغە نین غەیری ئەو چوارە، نەك لەنێو هەموو دروستكراوەكانی خواداو، لەنێو هەموو ئەو شتانەدا كە دەخورێن، هیچ شتێك قەدەغە نەبێت، جگە لەو چوارانە، بەڵكو مەبەست ئەوەیە كە ئەو شتانەی كە كافرەكان لە خۆیانیان قەدەغەكردبوون، لەسەر بناغەی ئەفسانەو لەسەر بناغەی بتپەرستیی، ئا ئەوانە هیچیان قەدەغەنین، وە بەڕاستی ئەم ڕایەشیان لە ڕاستییەوە نزیكترە، چونكە فەرمایشتەكانی پێغەمبەر ﷺ زۆر بەهێزن لە ڕووی سەنەدەوە، هەروەها هەر لەوبارەوە پرسیار لە پێغەمبەر ﷺ كراوە دەربارەی كەرانی ماڵی (الحمر الأهلية) فەرموویەتی: حەرامو قەدەغەن، بە پێچەوانەی كەرانی كێویی (الحمر الوحشية)، كەری كێوی دیارە حەڵاڵە، وە دەربارەی حەرامیی هەموو خاوەن چڕنووكێك لە پەڕەوەرەكان، وە هەموو خاوەن كەڵبەیەك لە دڕندەكان، پێغەمبەر ﷺ زۆر بە ڕوونیی فەرموویەتی: حەرامو قەدەغەن، كەواتە: مەبەست لە ئایەتەكە ئەوەیە كە ئەو شتانەی كافرەكان لە خۆیانیان قەدەغەكردوون، لە ئاژەڵان، هیچیان قەدەغەنین، جگە لەو چوارانە.

ئنجا بێینە سەر ڕوونكردنەوەی هەندێك حوكمی شەرعیی كە لەم ئایەتە وەردەگیرێن:

**یەکـەم:** دەربـارەی ﴿ ٱلْمَيْتَةَ ﴾، مـردار، مـردار چـییە؟ (الـمَيْتَةَ)، وە بـە (الـمِيتة)ش خوێنلراوەتـەوە:

١/ (القُرطُبي)[1] دەڵێ: (الـمَيتـة: مَا فَارقَتْهُ الـروح مِن غَيـر ذكَـاة مِمَّا يذبحُ، ومـا لَيسَ بمَأكـولٍ فذكَـاته كموتـهُ كَالـسِّباعِ وغَيـرهُ)، واتـە: مـردار هەرشتێکە کە ژیانی لێ جیابێتەوە {ئـەو دەڵـێ: ڕووح، بەڵام مـن پـێم وایـە غەیری ئینسان ڕووحی نیەو هەر ئینسـان ڕووح لەبەرە، بۆ غـەیری ئینسـان دەبـێ بڵـێی: ژیانـەوەرو تـەنیا ژیانیـان هەیـە، چونکـە خـوای بـەرز وشـەی ڕووحـی تـەنیا بـۆ ئینسـان بەکارهێنـاوە، بـەڵام وشـەی ژیـان (حیـاة)ی بـۆ غەیری ئینسـانیش بەکـارهێناوە، لـە ڕووەکو ئـاژەڵو پـەلـەوەرو دڕنـدەو زینـدەوەران ...}، بـەبێ سـەربڕین لـەو شـتانەی کـە سـەردەبڕدرێن،{واتـە: ماسـیو کوللـە، کـە سـەرنابڕدرێن ئـەوە بـە مـردار لەقەڵـەم نـادرێن، بـا ژیانیشیان لـێ چووبێتە دەرێو سەریشنەبڕابن}، بـەڵام ئـەوەی کـە گۆشـتی ناخورێ، سەربڕانییشی وەك مرداربوونەوەی وایە، وەك: دڕنـدەکان {گـورگو شێرو پڵنگو سـەگ} و غەیری ئەوانەش.

٢/ ئنجا ئـەو ئایەتـەی کـە دەفـەرموێ: ﴿ إِنَّمَا حَرَّمَ عَلَيْكُمُ ٱلْمَيْتَةَ ﴾، کەواتـە مـردار هـەمووی قەدەغەیـە، کـە ئـەم ئایەتـە گشـتییە، بـەڵام ئایەتێکـی دیکەمان هەیـە تایبـەتی دەکـا، وەك لـە باسـی (الناسخ و الـمَنْسوخ) باسمان کرد کە قورئان هیچ ئایـەتێکی تێدا نیـە (مَنْسوخ) بێت، بـەڵام ئایـەتی تێدا هەیە گشـتییەو، ئایەتێکـی دیکە مەفهوومەکەی تایبـەت کـردوە بـە هەنـدێ شـتەوە، یـان هـەندێ شـتی لـێ هەڵاوێـردوون، بـۆ وێنــە: لـە سـوورەتی (الـمائدة)دا خـوای کاربـەجێ دەفـەرموێ: ﴿ أُحِلَّ لَكُمْ صَيْدُ ٱلْبَحْرِ وَطَعَامُهُۥ مَتَٰعًا لَّكُمْ وَلِلسَّيَّارَةِ ...﴿٩٦﴾ ﴾، واتـە: ئێوە نێچیری دەریـاو خواردنی دەریـاتان

---

١) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ج: (٢)، ص (١٩٢).

بۆ حەڵاڵ کراوە، بۆ خۆتان و بۆ ئەوانەی کە ڕێبوارن، لێیان بەهرەمەندبن. کەواتە: وشەی (میتة) تەنیا مرداری وشکانی دەگرێتەوەو مرداری دەریا ناگرێتەوە، ئەوەتا خوا دەفەرموێ: هەموو ژیاندارێك کە لە دەریادا دەیگرن و ڕاوی دەکەن، بۆتان حەڵاڵە، هەروەها هەر خۆراکێکی دەریایی حەڵاڵە، ژمارەیەك لە زانایان دەڵێن: (صَيْدُ) (نێچیر)، ئەوەیە کە ڕاوی دەکەی لە دەریاداو، (طعام) خۆراك ئەوەیە کە بۆ خۆی دەمرێ، مادام لە ڕووی تەندروستییەوە خراپ نەبێ و بۆگەن نەبوو بێت، لە ڕووی شەرعییەوە حەڵاڵە، وە پێغەمبەریش ﷺ هەر لەبەر ڕۆشنایی ئەم ئایەتەی سوورەتی (المائدة)دا دەفەرموێ: {(أُحِلَّت لَنَا مَيْتَتَانِ: الحُوتُ وَالجَرَّاد، و دَمَانِ: الكَبِدُ وَ الطِّحَال) (أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٥٧٢٣)، الدارقُطني برقم: (٤٦٨٧)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٣٣١٤)، عَنْ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنه، وَصَحَّحَهُ الألباني في (السلسلة الصحيحة) برقم: (١١١٨)}، واتە: (دوو مردارمان بۆ حەڵاڵن: ماسی و کوللە، وە دوو خوێنیش: جگەر و سپڵ).

٣/ زۆربەی زانایان دەڵێن: هەرچی ژیانداری دەریایە هەمووی دەخورێ، بە زیندوویی بیگری، یان بە مردوویی، مادام نەگۆڕابێ، کە ئەوە مەزهەبی ئیمام مالیکەو پرسیاری لێکراوە دەربارەی بەرازی دەریا، ئەویش گوتوویەتی[1]: (أَنْتُمْ تَقُولُونَ خنزِيراً)، واتە: جا ئێوە ناوتان لێناوە بەراز! یانی: نەیگوتوە حەرامە، بەڵام گوتوویەتی: ئێوە پێی دەڵێن بەراز، بەڵام لە ڕاستیدا بەرازی دەریاش مادام خوا بەگشتی فەرموویەتی با ناویشی بەراز بێ ئەویش هەر حەڵاڵە، واتە: هەرچی ژیاندارو زیندەوەری لە دەریادا هەیە لە ڕووی شەرعییەوە حەڵاڵە، مەگەر لە ڕووی تەندروستییەوە خراپ و زیانبەخش بێ، چونکە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿يَسْـَٔلُونَكَ مَاذَآ أُحِلَّ لَهُمْۖ قُلْ أُحِلَّ لَكُمُ ٱلطَّيِّبَٰتُ ... ﴿٤﴾﴾ المائدة، کەواتە لە دەریاشدا ئەگەر شتێك هەبێ

---

١) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ج: (٢)، ص (١٩٩).

خراپو زیانبەخش بۆ هەر حەرامە لە سۆنگەی ئەوەوە کە خوا دەفەرمویٚ: شتی پاكو چاكو سوودبەخش حەڵاڵە، کەواتە: هەرچەندە ئایەتەکە ڕایدەگەیەنێ کە نێچیرو خۆراکی دەریا بە گشتی حەڵاڵە، وەك دەفەرمویٚ: ﴿ أُحِلَّ لَكُمْ صَيْدُ الْبَحْرِ وَطَعَامُهُ مَتَاعًا لَّكُمْ وَلِلسَّيَّارَةِ ... ﴿٩٦﴾ ﴾ المائدة، بەڵام مادام دەرکەوت شتێك لەڕووی تەندروستییەوە زیانبەخشە، ئەوە مانای وایە ئەو شتە لە خۆشو سوودبەخشەکان (طَيِّبَات)نیە، بەڵكو لە ناخۆشو زیانبەخشەکان (خبائث)ەو، (خبائث)یش هەمووی حەرامە.

٤/ ئنجا زانایان دەربارەی ئەوە کە ئایا سوننەتی پێغەمبەر ﷺ دەتوانێ قورئان تایبەت (تَخْصِيص) بکات، ئەگەر خوا شتێکی بە گشتی فەرموو بێ، ئایا سوننەت دەتوانێ تایبەتی بکات ؟ زانایان لەوبارەوە مشتومڕیان هەیە، وە ئەوانەی ڕایان وایە سوننەت قورئان تایبەت دەکات ئەم دەقەی سوننەت بە بەڵگە دەهێننەوە: {(عَنْ عَبدِاللهِ بْنِ أَبي أَوفى رضي الله عنه، قَالَ: غَزَوْنا مَعَ رَسولَ اللهِ ﷺ سَبعَ غَزَوَاتٍ نَأكُلُ الجَرَّاد) (رَوَاهُ البُخَاري بِرقم: (٥٤٩٥)، ومُسلم برقم: (٥٠١٩)، والتِّرمِذِيّ برقم: (١٨٢٢)، وَالنَّسَائِيُّ برقم: (٤٣٦٨)}، واتە: (عَبدُالله بنِ أَبي أَوفى) دەڵێ: ئێمە لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ حەوت جەنگمان کردن کوللەمان دەخوارد.

گوتوویانە: مادام خوا دەفەرمویٚ: ﴿ حُرِّمَتْ عَلَيْكُمُ الْمَيْتَةُ ﴾، مردار بووتان لێ حەرامە، لێرەشدا دەفەرمویٚ: کوللەیان خواردوە، کەواتە: دەبێ بڵێین: سوننەتی پێغەمبەر ﷺ ئایەتی قورئان تایبەت (تَخْصِيص) دەکات، بەڵام من پێم وایە ئەوە وانیەو سوننەتی پێغەمبەر ﷺ قورئان تایبەت ناکاتو هیچ تێکگیرانێکیش لەنێوان حوکمەکەی قورئانو سوننەتدا نیە، چونکە مەبەست لە وشەی (مردار) لە قورئاندا مرداری ئاژەڵو ژیاندارانە، نەك مرداری زیندەوەرانی وەك کوللەو هاووێنەکانی، چونکە وەك پێشتر باسمان کرد، سەرجەم ئەو چوار سیاقەی باسی ئەو

چوار شتە قەدەغەکراوانەیان تێدا هاتون، باسی گۆشتی ئاژەڵو ژیانداران دەکەن، کە هاوبەش دانەرەکان تێیدا گیرۆدەی لادان (انحراف) بوو بوون.

٥/ بەنسبەت ئەو بێچووەی کە لەنێو سکی ئاژەڵ دایە، جا وشتر بێ رەشەوڵاخ بێ، مانگا بێ، گامێش بێ، یاخود مەڕو بزن بێ، ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەر ﷺ هاتوە: {(عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ رضي الله عنه، قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ! نَنْحَرُ النَّاقَةَ، وَنَذْبَحُ الْبَقَرَةَ أَوِ الشَّاةَ فِي بَطْنِهَا جَنِينٌ مَيِّتٌ، أَنُلْقِيهِ أَمْ نَأْكُلُهُ؟ فَقَالَ: كُلُوهُ إِنْ شِئْتُمْ، فَإِنَّ ذَكَاةَ الْجَنِينِ ذَكَاةُ أُمِّهِ) (رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ برقم: (٢٨٢٧)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٣١٩٩)، وَقَالَ شُعيب الأَرناؤوط: حَدِيثٌ صَحِيح بِطُرُقِهِ وشَوَاهِدِهِ، وَصَحَّحَهُ الأَلباني} واتە: ئەبوو سەعیدی خودریی خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ: گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا! ﷺ ئێمە کە وشتر پەل دەکەینو مانگاو مەڕ کە سەردەبڕین {حوشتری ناو ناوە (نحر)، چونکە حوشتر دەبێ پێی ببڕن، ئەوجار دوایی دەگونجێ سەر ببڕدرێ} بێچووی مردوویان لە سکدا دەبێ، ئایا فڕێی بدەین یان بیخۆین؟ فەرمووی: ئەگەر حەزتان کرد بیخۆن، چونکە سەربڕینی دایکی سەربڕینی بێچووەکەشیەتی.

٦/ دەربارەی پێستی ئاژەڵی مرداربوو پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: {(أَيُّمَا إِهَابٍ دُبِغَ فَقَدْ طَهُرَ) (رَوَاهُ أَحْمَد برقم: (١٨٩٥)، وَالتِّرمِذِي برقم: (١٧٢٨) وَقَالَ: حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٤١٢٣)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٣٦٠٩)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (١٢٨٨)، وَالطَّبَرَانِي فِي (الأوسط) برقم: (٧٢٨٩) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنه)، واتە: هەر پێستێك دباغ کرا (لە کوردەوارییدا دەڵێن: خۆشکرا) ئەوە پاك بۆتەوە، (دەباغ)یش ئەوەیە کە هەرچی ماددەی گۆشتو چەوریی‌و هەیە لێی لادەبا، وە چەرمە ساغەکەی دەهێڵێتەوە، ئنجا لێرەدا هەندێ فەرمایشت هەن کە بۆ هەندێ لە زانایان بوونە جێی مشتو مڕ (إشكال)، بۆ وێنە: ئەم فەرمایشتە کە دەفەرموێ: {(مَرَّ رَسُولُ

اللهِ ﷺ عَلَى شَاةٍ لِـمِيمُونَةَ يَجُرُّونَهَـا، فَقَـالَ: لَـو أَخَذتُم إِهَابَهَـا؟ فَقَـالوا: إِنَّهَا مَيتَةٌ، فَقَالَ: يُطَهِّرُهَا الماءُ والقَرَظُ) (رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ برقم: (٤١٢٦)، وَابْنُ حِبَّانَ بِرقم: (١٢٩١)، وَصَحَّحَهُ الأَلبَاني في (السلسلة الصحيحة) برقم: (٢١٦٣)}، واتـە: پێغەمبەر ﷺ بەلای مەڕێکدا تێپەڕی کە هی مەیموونەی خێزانی بوو خوا لێی ڕازی بێت، دایکی ئیمانداران، فەرمووی: بۆچی پێستەکەیتان دانەدڕی؟ (واتە: دەبوو پێستەکەیتان لێکربایەوە سوودتان لێ ببینایە) گوتیان: ئاخر مرداربۆتەوە! فەرمووی: ئاوو مازوو پاکی دەکاتەوە، (واتە: بە دەباغکردن خاوێن دەبێتەوە)، جا لەوبارەوە ئەم فەرمایشتە هەیە کە دەباغکردن پێستی ئاژەڵی مردار خاوێن دەکاتەوە.

لەولاشەوە لە فەرموودەیەکی دیکەدا پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {(لا تَنْتَفِعُوا مِنَ المَيْتَةِ بِشَيءٍ) (أَخْرَجَهُ البُخَارِي في (التاريخ) (١٦٧/١/٤)، عَنْ عَبْدِ اللّٰهِ بْنِ عُكَيْمٍ، وَصَحَّحَهُ الأَلبَاني في (السلسلة الصحيحة) برقم: (٣١٣٣)}، واتە: هیچ سوودێك لە مردار مەبینن، دیارە ئەوە پێستەکەیشی دەگرێتەوە.

لە گێڕانەوەی دیکەدا هاتوە فەرموویەتی: {(لاَ تَنْتَفِعُوا مِنْ الْمَيْتَةِ بِإِهَابٍ وَلاَ عَصَبٍ)) (أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (١٨٦٨٤)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (١٧٢٩) وقَالَ: حَدِيثٌ حَسَنٌ، وَالنَّسَائِيُّ برقم: (٤٢٦٠)، عَنْ عَبْدِ اللّٰهِ بْنِ عُكَيْمٍ، وَصَحَّحَهُ الأَلبَاني في (إرواء الغليل) برقم: (٣٨)}، واتە: سوود لە مردار مەبینن، نە لە پێستەکەی نە لە ڕەگو دەمارەکەی، واتە: بە هیچ شێوەیەك لێی بەهرەمەند مەبن، بەڵام من پێم وایە بۆ تەوفیقی نێوان فەرمایشتەکان دەبێ بڵێین، ئەوە کە دەفەرموێ: سوود لە مردارەوە بوو مەبینن، لە هیچ شتێکی لە دەمارو پێستەکەیشی، مەبەستی ئەوەیە کە پێستێك دەباغ نەکرابێ و خۆش نەکرابێ، ئەوە بە پیس دادەنرێ، بەڵام کە خۆش کرا، وەك پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {(أَيُّمَا إِهَابٍ دُبِغَ فَقَدْ

طَهُـرَ)} كـە پێـشتـر (تخـريج) كـرا، كەواتـە: بـەو شـێوەيە هـەموو فەرمايشتەكان كۆدەكرێنەوەو هيچ جۆرە تێكگيـرانێكيان لەنێواندا نابێ.

٧/ دەربـارەی مـشك كـە دەكەوێتـە خواردنێكـەوە، پرسـيار لـە پێغەمبـەر ﷺ كـراوە: {(عَنْ أَبِـي هُرَيْـرَةَ رضي الله عنه قَـالَ سُئِلَ الـنَّبِيُّ ﷺ عَـنْ الْفَـأْرَةِ تَقَـعُ فِـي السَّمْنِ فَتَمُوتُ، فَقَـالَ: إِنْ كَـانَ جَامِداً فَاطرَحُـوهَا وَمَا حَولَـهَا، وإِنْ كَـانَ مَائِعَـاً فَأَرِيقُـوهُ) (رَوَاهُ الطَّـبَرَانِي بـرقم: (١٠٤٥)، وَابْـنُ حِبَّـانَ بـرقم: (١٣٩٢)، وَأَبُـو دَاوُدَ برقـم: (٣٨٤٢)، وَالتِّرمِـذِيُّ بـرقم: (١٧٩٨)}، واتـە: ئـەبو هـورپـرە خوا لـێی ڕازی بێ دەڵێ: پرسيار لە پێغەمبەر ﷺ كرا: مشك دەكەوێتـە نێو ڕۆنەوەو تێيدا دەمرێ، چی لـێ بكـەين؟! فەرموويـەتی: ئەگەر ڕۆنەكە وشك بوو مشكـەكەو ئەو ڕۆنەی دەوروبەريشی فڕێ بـدەنو، ئەويديكـە سـوود لـێ ببينـن، بـەڵام ئەگـەر ڕۆنەكـە شل بـوو بيـڕێژنو سـوودی لـێ مـەبينن، هەڵبەتـە ئـەوەش شتێكی عيلمـييە، چـونكە ئەگەر وشـك بێـت مانـای وايـە بـڵاونەبۆتەوە، بـەڵام ئەگەر شـل بـێ، ديـارە لەگـەڵ هـەمووی تێكـەڵ بـووە، لەبەر ئەوە بەكـەڵـك نەماوە.

٨/ هـەروەها دەربـارەی پەنيـرو ڕۆنو فـەروەو ئـەو شـتانەی كـە دێنـە بـازاڕ، پرسـيار لـە پێغەمبـەر ﷺ كـراوە كـە هـی غـەيری مـسوڵمانانن دێنـە بـازاڕ، نازانـرێ كـێ دروسـتی كـردوون، ئايـا حوكميـان چييە؟ {(سُئِلَ رَسُولُ اللهِ ﷺ عَنِ السَّمنِ وَالجُبنِ وَالفـرَاءِ ؟ فَقَـالَ: الحَـلاَلُ مَـا أَحَلَّ اللهُ فـي كِتَابـهِ، والحَرَامُ مَا حَرَّمَ اللهُ فـي كِـتَابِهِ، ومَـا سَكَتَ عَنْهُ فَهُوَ مِمَّا عَفَا عَنْهُ)} (رَوَاهُ التِّرمِـذِيُّ برقم: (١٧٢٦)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٣٣٦٧)، وَالطَّبَرَانِي فـي (الكبيـر) برقم: (٦١٢٤)، وَالحَاكِمُ برقم: (٧١١٥)، عَنْ سَلْمَانَ الْفَارِسِيِّ رضي الله عنه، وَحَسَّنَهُ الألباني فـي (الـمشكاة) برقم: (٤٢٢٨)}، واتـە: پرسيار لـە پێغەمبـەر كـراوە ﷺ دەربـارەی ڕوون پەنيـرو فـەروە (كە لەبـەر دەكـرێ) فـەرمووی: حـەڵاڵ ئەوەيە كە خوا لـە كـتێبی خۆيـدا حەڵاڵـی كـردبێو قەدەغـە ئەوەيە كـە

خوا له كتێبی خۆیدا قەدەغەی كردبێ، وە ئەوەی لێی بێدەنگ بووە ئەوە لەوەیە كە بە ڕەوایی هێشتوویەتەوە. واتە: حەڵاڵەو ڕەوایە.

**دووەم :** دەربارەی ﴿ الدم ﴾ خوێن: خوا ﷻ لە سێ شوێندا هەر دەفەرموێ: ﴿ وَٱلدَّمَ ﴾وە خوێن، وە لە یەك شوێن لە ئایەتی ژمارە (١٤٥) سووڕەتی (الأنعام)دا دەفەرموێ: ﴿ ... أَوْ دَمًا مَّسْفُوحًا ...﴿١٤٥﴾ ﴾، واتە: خوێنەكە وەسف دەكا بە وشەی: ﴿ مَّسْفُوحًا ﴾ واتە: خوێنی ڕژاو، هەڵبەتە خوا ﷻ هەر بۆخۆی كاربەجێ‌و میهرەبانە، ئەگەر بەم وشەی: ﴿ مَّسْفُوحًا ﴾ە، كە لە سووڕەتی (الأنعام)دا هاتوە، خوێنی بۆ وەسف نەكردباین دەبوو هەر چێشتێكمان لێ دەنا تۆزێ ڕەنگی خوێنی دەگرت، نەیخۆین‌و ئەوەش دەبوو بە مەشەقەتێكی زۆر لەسەر خەڵك، چۆن خوێن لە دەماری گۆشت دەربێنن ! ئەوە زۆر زەحمەتە، بۆیە زانایان دەڵێن: لە هەر شوێنێك وشەیەك لە قورئاندا بە نادیاریی‌و بە گشتی هاتبێ‌و، لە شوێنێكی دیكە وشەكە بە شەرحكراویی هاتبێ، ئەوەی كە بە نادیاریی (مُبْهَم)ی‌و گشتیی هاتوە، لەبەر ڕۆشنایی ئەوەدا كە بە ڕۆشنیی هاتوە، دەبێ لێی حاڵی بین، كەواتە: مەبەست لە خوێن، خوێنی ڕژاوە (خوێنێك كە بڕژێ، بێنی كۆی بكەیەوە) وەك لەنێو عەرەبەكان عادەتیان وابووە، خواردنێكیان هەبووە پێی گوتراوە (فَصْد) ئەویش ئەوە بووە كە میوانیان هاتوە، جاری وابووە كابرا حوشترێكی هەبووە دڵی نەهاتوە سەریببڕێ، خواردنی دیكەشی نەبووە، بۆیە خوێنی حوشتری بەرداوە هی لاقی یان شوێنێكی دیكەی، دوایی كە خەست بۆتەوە لەسەر ئاگر برژاندوویانە، ئەوە پێی گوتراوە: خواردنی (فَصْد)، واتە: خوێنی گیراو، ئەوە بووە كە خوا زیاتر مەبەستی بووەو قەدەغەی كردوە، وە بە هەر شێوەیەكی دیكە خوێن بەكاربهێنرێ بۆ خواردن، دیارە هەر قەدەغەیە، بەڵام خوێنێك كە لەنێو دەمارو ڕەگەكان دایە، ئەوە زیانی نیە.

**سێیەم:** دەربارەی ﴿ وَلَحْمَ ٱلْخِنزِيرِ ﴾، گۆشتی بەراز، دیارە بەراز هەمووی پیسە، ئەدی چۆنە خوای کاربەجێ تەنیا باسی گۆشتەکەی کردوە؟ (القُرطُبي) ڕەحمەتی خوای لێبێ جوانی ڕوون کردۆتەوە، دەڵێ[1]: (خَصَّ الله تعالى ذكر اللحم لِيَدلَّ عَلَى تحرِيمِهِ ذُكِّيَ أم لَم يُذَكَّ)، واتە: بۆیە بە تایبەت باسی گۆشتەکەی کردوە، هەتاکو بزاندرێ کە ئەگەر سەر ببڕدرێ یاخود مرداربێ، بەراز هەر حەرامە، واتە: ئەگەر نەیفەرمووبایە گۆشتی بەراز، ئەوکاتە ڕەنگە یەکێ بیگوتبایە: ئەگەر سەرببڕدرێت قەیدێناکە، بەڵام کە فەرموویەتی گۆشتی بەراز، مانای وایە بە زیندوویی بێ، یان بە مرداریی، هەر حەرامە، ئەگەرنا کە دەفەرموێ: گۆشتی بەراز، بەزو دەمارو کرۆژکرۆژە ... هەمووی دەگرێتەوە.

**چوارەم:** دەربارەی ﴿ وَمَآ أُهِلَّ بِهِۦ لِغَيْرِ ٱللَّهِ ﴾، وە ئەوەی کە ناوی غەیری خوای لەسەر هێنرابێ، ئەوە دیارە کە هەر سەربڕاوێك ناوی غەیری خوای لەسەر هاتبێ، قەدەغەیە، کە مەبەست پێی ئەوەیە ئەوانەی نا مسوڵمانن ناوی پەرستراوی غەیری خوا لەسەر ئەو سەربڕاوانەی خۆیان دێنن، وەك مەجووسییەکان بۆ ئاگر سەریان دەبڕن و، بتپەرستەکان بۆ بت و سەنەم سەریان دەبڕن، وە بابایەکی (مولحید) کە بڕوای بە هیچ شتێك نیە کاتێك ئاژەڵێك سەر دەبڕێ، هەر بۆخۆی سەری دەبڕێ بە ناوی خۆی، مانای وایە هەموو ئەوانە ناوی غەیری خوایان لەسەر هاتوە، بۆیە قەدەغەن، جا ئەوانی دیکە بۆیە قەدەغەن، چونکە زەرەری جەستەیی یان هەیە، بەڵام ئەمەیان بۆیە قەدەغەیە، چونکە زەرەری ڕووحیی و مەعنەویی هەیە، وە لە ڕاستیدا گۆشتی بەراز وێڕای زەرەری جەستەیی، زەرەری مەعنەوییشی هەر هەیە، چونکە بەراز کۆمەڵێك سیفەتی پەستی هەن، یەکێك لەوانە زۆرکەم بەتەنگ نامووسیەوەیەتی و لە پەنای خۆی سواری مێیەکەی بن

---

[1] هەمان سەرچاوەو بەرگ، ص (١٩٨).

هیچ کاردانەوەیەکتی نابێ! هەروەها زۆر پیس خۆرە، بۆیە هەرکەسێك گۆشتی بەراز بخوات، یان هی دڕندەکان، کەمو زۆر خوووو خدەو سیفەتەکانی ئەو ژیاندارانەی بۆ دەگوازرێنەوە، ئەمەش لە ژیانی ڕۆژئاواییەکاندا (الغربیّون) بە زەقی دیارە.

**مەسەلەی دەیەم:** وەك بنچینەیەکی شەرعیی، زۆربەی زانایان ئەگەر نەڵێین هەموویان، لەسەر ئەوە یەك دەنگن کە ئینسانی مسوڵمان کاتێك تێدەگیرێ‌و ناچار دەبێ، واتە: برسی دەبێ‌و هیچ شتێکی دەست ناکەوێ بیخوات، لەو کاتەدا بۆی هەیە لەو چوار شتانە بخوات، لە مردارەوە بووو خوێن‌و گۆشتی بەرازو شتێك کە بۆ غەیری خوا سەربڕابێ‌و ناوی غەیری خوای لەسەر هاتبێ، مادام هیچ شتێکی دیکەی دەست نەکەوێ، ئەگەرنا ئەگەر شتی دیکەی دەست بکەوێ، هی خۆی نا هی غەیری خۆی، بۆی نیە لەو چوار قەدەغەکراوانە بخوات، لەوبارەوە چەند فەرمایشتێکی پێغەمبەر ﷺ هەن کە بە بەڵگە دەهێنرێنەوە:

**یەکەم:** {(عَنْ عَبَّادِ بْنِ شُرَحْبِيلَ رضي الله عنه، قَالَ: أَصَابَنَا عَامُ مَخْمَصَةٍ، فَأَتَيْتُ الْمَدِينَةَ، فَأَتَيتُ حَائِطًا مِنْ حِيطَانِهَا، فَأَخَذْتُ سُنْبُلا فَفَرَكْتُهُ، فَأَكَلْتُهُ، وَجَعَلْتُهُ فِي كِسَائِي، فَجَاءَ صَاحِبُ الْحَائِطِ، فَضَرَبَنِي وَأَخَذَ ثَوْبِي، فَأَتَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ فَأَخْبَرْتُهُ، فَقَالَ لِلرَّجُلِ: (مَا أَطْعَمْتَهُ إِذْ كَانَ جَائِعًا أَوْ سَاغِبًا، وَلا عَلَّمْتَهُ إِذْ كَانَ جَاهِلاً، فَأَمَرَهُ النَّبِيُّ ﷺ فَرَدَّ إِلَيْهِ ثَوْبَهُ، ثُمَّ أَمَرَ لَهُ بِوَسْقٍ مِنْ طَعَامٍ أَوْ نِصْفِ وَسْقٍ) (رَوَاهُ أَحْمَدُ بِرقم: (١٦٠٦٧)، وَأَبُو دَاوُدَ بِرقم: (٢٦٢٠)، وَابْنُ مَاجَهْ بِرقم: (٢٢٩٨) وَاللَّفْظُ لإبنِ مَاجَه، وَصَحَّحَهُ الألباني في (السلسلة الصحيحة) برقم: (٢٢٢٩)} واتە: (عَبَّادُ بْنُ شُرَحْبِيلَ) (کە یەکێکە لە هاوەڵانی بەڕێز خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە دەڵێ: ساڵێك ئێمە برسیەتیی‌و گرانییەکمان توشبوو چوومە شاری مەدینەو لەوێش چوومە نێو باغێکەوە، لە کێڵگەو باغەکانی مەدینە چەند گوڵە گەنمێکم {ئایا گوڵە گەنم بووە، گوڵە جۆ بووە} لێ کردنەوەو لە دەستی خۆمدا پرواندنم (واتە: دانەکەم لێ جیاکردنەوە)، هەندێکم خوارد، وە ئەو

دیکەشم لە گیرفانم کرد، دوایی خاوەن باغەکە هات لێشی دامو بەرگەکەشی لێ ستاندم (دیارە ئەوە بووە کە گەنمەکەی یاخود دانەوێڵەکەی تێوە پێچاوە)، منیش چوومە لای پێغەمبەر ﷺ هەواڵم پێدا، ئەویش بە کابرای فەرموو: نە کە برسیو سەغڵەت بووە تێرت کردو، نە کە نەزان بووە فێرت کردوە ! ئنجا فەرمانی پێکرد کە پۆشاکەکەی وێداتەوە، (دیارە پۆشاکەکەی وێداوەتەوە) ئنجا پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کرد کە (وسْق)ێك یان نیو (وسْق)، {کە (وسْق)ێك شەست (صاع)ە، (صاع)یش چوار مستە} خواردنیْ بدەن بەو (عَبَّادَ بنَ شُرَحْبِيلَ) صاعیش ڕبەی کوردەواریی خۆمانە.

**دووەم:** لەوبارەوە کە ئەگەر ئینسان شتی خۆی نەبوو بیخواتو ناچار بوو با شتی خەڵکیشی دەست بکەویْ بۆی هەیە بیخوات، ئەگەر ناچار بوو، با لە حاڵەتی ئاساییشدا لێی قەدەغە بێت، بەڵکو ئەگەر دزیی لێبکات، تووشی سزاش دەبیْ[1]، یەکی دیکە لەو فەرموودانەی پێغەمبەر ﷺ ئەمەیە: {(مَنْ دَخَلَ حَائِطًا فَلْيَأْكُلْ، وَلاَ يَتَّخِذْ خُبْنَةً)) (رَوَاهُ التِّرمِذِيّ برقم: (١٢٨٧)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٢٣٠١)، عَن ابْنُ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، وَصَحَّحَهُ الألباني في (سُنَن التِّرمِذِي))}، واتە: هەر کەسێك - دیارە مەبەستی ئەوەیە کە برسی بوو - چووە باغێکەوە با بخوات، بەڵام با لە گیرفانی نەکا، یان پاشەکەوت نەکات.

**سێیەم:** {(إذَا أَتَى أَحَدُكُم عَلَى ماشِيَةٍ، فَإنْ كَانَ فِيهَا صَاحِبُهَا فَلْيَستأْذِنْهُ، فَإنْ أذِنَ لَهُ فَلْيَحْتَلِبْ وليَشْرَب، وإنْ لَمْ يَكُن فِيهَا أحَدٌ فَلْيُصَوِّتْ ثَلاثاً، فَإنْ أجَابَهُ أحَدٌ فَلْيَستأْذِنهُ، فإنْ لَمْ يُجِبْهُ أحَدٌ فَلْيَحتلِبْ ولِيَشرَب ولاَ يَحْمِلْ) (رَوَاهُ أبُو دَاوُدَ برقم: (٢٦١٩)، وَالتِّرمِذِيّ برقم: (١٢٩٦) عَنْ سَمُرَةَ بْنِ جُنْدُبٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، وَحَسَّنَهُ الألباني في (صحيح أبي داود) برقم: (٢٣٥٦)}، ئەوەی پێشی باسی باغو کێڵگەو کشتوکاڵ بوو، ئەمەیان باسی مەڕو ماڵاتە، کابرا لە بیابانە لە دەشتێکی چۆڵ لێی دەقەومیْ هیچی دەست ناکەویْ بیخوات، چی بکات ؟!

---

١) واتە: لە حاڵەتی ئاساییدا بۆی نیە دزیی بکاتو لەسەری تووشی .

ئەم فەرموودەیە وەڵامە:

واتە: یەکێك لە ئێوە ئەگەر بەلای ماڵاتێکدا تێپەڕی {ڕەشە وڵاخ بوو، مەڕ بوو، بزن بوو، حوشتر بوو} ئەگەر خاوەنەکەی تێدا بوو، {لەگەڵ ماڵاتەکەی بوو لەگەڵ ئاژەڵەکانی بوو}، با داوای مۆڵەتی لێبکا، ئەگەر مۆڵەتیدا، با بدۆشێو لە شیرەکەیان بخواتەوە، بەڵام ئەگەر خاوەنەکەی تێیدا نەبوو، با سێ جار بانگ بکا، ئەگەر وەڵامی دایەوە با داوای مۆڵەتی لێبکا، بەڵام ئەگەر کەس وەڵامی نەدایەوە، با بایی ئەوەندە کە ڕزگاری دەکا شیریان لێ بدۆشێو بیخواتەوە، بەڵام لێی پاشەکەوت نەکا، کەواتە ئەم فەرموودانە زۆر بە ڕاشکاویی ئەوە دەگەیەنن کە ئینسان وەختێك لێی دەقەومێ لە شاخێك، لە چیاو چۆڵێك، بۆی هەیە هەرچی بەرپەلی بکەوێ، لە خواردنو خۆراکی خەڵکی بیخواتو، خۆی لە مەرگ دەرباز بکات، دیارە لەو حاڵەتەشدا سزای دزیی بەسەردا ناچەسپێنرێ، چونکە بە ناچاریی پەنای بۆ ئەوە بردوە، وە عومەر خوا لێی ڕازی بێ لە ساڵی گرانییدا سزای دەستبڕینی ڕاگرت، وە گوتی: ئێمە ناتوانین نانو خۆراك بۆ خەڵکی دابین بکەین، لەبەر ئەوە نابێ سزاشیان بدەین، چونکە لە برسانو بە ناچاریی دزیی دەکەن.

**مەسەلەی یازدەیەم:** بەکارهێنانی ئەو شتانەی کە قەدەغە کراون، وەك: مرداره‌وەبووو خوێنو گۆشتی بەرازو، هەر شتێکی دیکە کە قەدەغە کراوە، بۆ وێنە: شەڕاب: دروست نیە وەك دەرمان بەکاربهێنرێ بۆ چارەسەر، ئەوە زۆربەی زانایان ڕایان وایە، وە ئەم فەرموودەیە لەوبارەوە هاتوە: {(إِنَّ اللهَ لَمْ يَجْعَلْ شِفَاءَكُم فِيما حَرَّمَ عَلَيكُم) (أَخْرَجَهُ الحَاكم برقم: (٧٥٠٩)، والطبراني في (الكبير) برقم: (٧٤٩)، عَن عَبدِ اللهِ بنِ مَسْعُودٍ رضي الله عنه، وذَكَرَهُ البُخاري تَعْلِيقاً}، واتە: خوا ﷻ چارەسەری ئێوەی لە شتێکدا دانەناوە، کە لێی قەدەغە کردوون، هەندێکیش لە زانایان دەڵێن دروستە، بەڵام ڕای ئەوانەی کە دەڵێن دروست نیە بەهێزترە، وە فەرمایشتەکەی پێغەمبەر ﷺ زۆر ڕوونو ڕاشکاوە لەوبارەوە.

لە کۆتاییدا بە پێویستی دەزانم ئاماژە بە چوار لە فەرمایشتەکانی پێغەمبەر ﷺ بکەم، کە چەند جۆرە ژیانداریێك لە حوکمی گشتی ئەو ئایەتانە هەڵداوێرن، کە خواردنە قەدەغەکراوەکان لە چوار شتاندا کورت هەڵدێنن کە: مردارو خوێنو گۆشتی بەرازو ناوی غەیری خوا لەسەر هێنراون، وە دەیخەنە ڕوو کە وێڕای ئەو چوار شتە ژیاندارانێکی دیکەش گۆشتیان حەڕامە:

فەرموودەی یەکەم: {(عَنْ أَبِي ثَعْلَبَةَ الْخُشَنِيِّ رضي الله عنه قَالَ: نَهَى النَّبِيُّ ﷺ عَنْ أَكْلِ كُلِّ ذِي نَابٍ مِنَ السِّبَاعِ)) (أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ برقم: (٥٥٣٠)، وَمُسْلِم برقم: (٤٩٦٥)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٣٨٠٢)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (١٤٧٧)، وَالنَّسَائِيُّ برقم: (٤٣٥٣)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٣٢٣٢)}، واتە: پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی کردوە کە هەر خاوەن کەڵبەیەك لە دڕندەکان، (وەك: شێر، پڵنگ، گورگ، چەقەڵ، کەمتیار کە گۆشت خۆرن) نابێ گۆشتیان بخۆرێو قەدەغەیە.

فەرموودەی دووەم: {(عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنه قَالَ نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنْ كُلِّ ذِي نَابٍ مِنَ السِّبَاعِ وَعَنْ كُلِّ ذِي مِخْلَبٍ مِنَ الطَّيْرِ) (أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٢٦١٩)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٣٨٠٥)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٣٢٣٤)، وَالطَّبَرَاني في (الكبير) برقم: (١٢٩٩٤) وصَحَّحَهُ أحمد شاكر}، واتە: پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی کردوە (خواردنی) هەر خاوەن کەڵبەیەك لە دڕندەکان، وە هەر خاوەن چڕنووکێك لە پەلەوەران.

فەرموودەی سێیەم: {(عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ رضي الله عنه أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ نَهَى يَوْمَ خَيْبَرَ عَنْ لُحُومِ الْحُمُرِ الأَهْلِيَّةِ، وَأَذِنَ فِي لُحُومِ الْخَيْلِ) (رَوَاهُ الْبُخَارِيُّ برقم: (٤٢١٩)، وَمُسْلِم برقم: (٤٩٩٧)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٣٧٨٨)، وَالنَّسَائِيُّ في برقم: (٤٣٣٨)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٥٢٧٣)}، واتە: جابری کوڕی عەبدوڵڵا خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لە ڕۆژی جەنگی خەیبەردا قەدەغەی کرد، کە گۆشتی کەری ماڵی بخورێ، (بۆیە وایانگوتوە تا جیای بکەنەوە لە کەری کێوی کە ڕەنگی بەڵەکەو گۆشتی دەخورێو حوکمی باقی

ئاژەڵانی گیاخۆری هەیە) بەڵام مۆڵەتیدا کە گۆشتی وڵاخە بەرزە بخورێ، (واتە: ماین و ئەسپ).

فەرموودەی چوارەم: {(عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَ: حَرَّمَ رَسولُ اللَّهِ ﷺ يَوْمَ خَيْبَرَ الْحُمُرَ الإِنْسِيَّةَ وَلُحُومَ الْبِغَالِ، وَكُلَّ ذِي نَابٍ مِنَ السِّبَاعِ، وَكُلَّ ذِي مِخْلَبٍ مِنَ الطَّيْرِ) (رَوَاهُ التِّرمِذِيُّ برقم: (١٤٧٨)، وَصَحَّحَهُ الألباني في (سُنَن التِّرمِذِي)}، واتە: پێغەمبەر ﷺ ڕۆژی خەیبەر ڕایگەیاندوە کە قەدەغەی کردوە، گۆشتی کەری ماڵی بخورێ، هەروەها هی هێستر، وە هەر خاوەن کەڵبەیەك لە دڕندان، وە هەر خاوەن چڕنووکێك لە باڵندان، کەواتە ئایەتەکە کە دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا حَرَّمَ عَلَيْكُمُ الْمَيْتَةَ وَالدَّمَ وَلَحْمَ الْخِنزِيرِ وَمَا أُهِلَّ بِهِ لِغَيْرِ اللَّهِ فَمَنِ اضْطُرَّ غَيْرَ بَاغٍ وَلَا عَادٍ فَلَا إِثْمَ عَلَيْهِ إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَحِيمٌ﴾، وەك پێشتریش گوتمان، واتە: تەنیا ئەو چوار گۆشتانەتان لێ قەدەغە کراون، لەو شتانەی کە باوبوون بخورێن، وە بەنسبەت هاوبەش بۆ خوا دانەرەکانەوە، کە گەلێك شتی دیکەیان لەخۆیان حەرام کردوە، وەك: (بحيرة، سائبة، وصيلة، حام)، کە ئەگەر تەمەن باقی بێ لە تەفسیری ئایەتەکانی دیکەدا کە دێن، إن شاء الله باسیان دەکەین.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

٥٧

# دەرسی سی و پێنجەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان لە ئایەتی ژمارە (١٧٤ تاکو ١٧٧) لە سوورەتی (البقرة) واتە: چوار ئایەت دەگرێتە خۆی، وە لەم ئایەتانەدا خوا ﷻ باسی دوو مەسەلە دەکات:

**مەسەلەی یەکەم:** ئەوانەی کە ئایەتەکانی خوا دەشارنەوەو بە نرخێکی کەم دەیانفرۆشن حوکمیان چییەو سزایان چۆنە؟ دیارە پێشتریش خوا ﷻ باسی ئەو مەسەلەیەی کرد، بەڵام لێرەدا بەشێوەیەکی دیکە باسی دەکات، بۆ زیاتر جەخت لەسەرکردن.

**مەسەلەی دووەم:** خوا ﷻ پێناسەی چاکەکاریی (بِرّ)مان بۆ دەکات.

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكۡتُمُونَ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ مِنَ ٱلۡكِتَٰبِ وَيَشۡتَرُونَ بِهِۦ ثَمَنٗا قَلِيلًا أُوْلَٰٓئِكَ مَا يَأۡكُلُونَ فِي بُطُونِهِمۡ إِلَّا ٱلنَّارَ وَلَا يُكَلِّمُهُمُ ٱللَّهُ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ وَلَا يُزَكِّيهِمۡ وَلَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿١٧٤﴾ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ ٱشۡتَرَوُاْ ٱلضَّلَٰلَةَ بِٱلۡهُدَىٰ وَٱلۡعَذَابَ بِٱلۡمَغۡفِرَةِۚ فَمَآ أَصۡبَرَهُمۡ عَلَى ٱلنَّارِ ﴿١٧٥﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ نَزَّلَ ٱلۡكِتَٰبَ بِٱلۡحَقِّۗ وَإِنَّ ٱلَّذِينَ ٱخۡتَلَفُواْ فِي ٱلۡكِتَٰبِ لَفِي شِقَاقِۭ بَعِيدٖ ﴿١٧٦﴾ ۞لَّيۡسَ ٱلۡبِرَّ أَن تُوَلُّواْ وُجُوهَكُمۡ قِبَلَ ٱلۡمَشۡرِقِ وَٱلۡمَغۡرِبِ وَلَٰكِنَّ ٱلۡبِرَّ مَنۡ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ وَٱلۡكِتَٰبِ وَٱلنَّبِيِّـۧنَ وَءَاتَى ٱلۡمَالَ عَلَىٰ حُبِّهِۦ ذَوِي ٱلۡقُرۡبَىٰ وَٱلۡيَتَٰمَىٰ وَٱلۡمَسَٰكِينَ وَٱبۡنَ ٱلسَّبِيلِ وَٱلسَّآئِلِينَ وَفِي ٱلرِّقَابِ وَأَقَامَ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَى ٱلزَّكَوٰةَ وَٱلۡمُوفُونَ بِعَهۡدِهِمۡ إِذَا عَٰهَدُواْۖ وَٱلصَّٰبِرِينَ فِي ٱلۡبَأۡسَآءِ وَٱلضَّرَّآءِ وَحِينَ ٱلۡبَأۡسِۗ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ صَدَقُواْۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُتَّقُونَ ﴿١٧٧﴾ ﴾.

## مانــای وشــە بە وشــەی ئایەتەکــان

((بێگومان ئەوانەی ئەوە کە خوا لـە کتێبـدا ناردوویەتـە خـوارێ، دەیـشارنەوەو نرخێکی کەمی پێ دەکڕن، ئا ئەوانە هەر ئاگر لە زگیاندا دەخۆن، ڕۆژی قیامەتیش خوا نایانـدوێنێو پاك وچاکیان ناکـاتو ئـازارێکی بـە ئـێشو ژانیـشیان هەیـە ﴿١٧٤﴾ ئەوانـە کەسانێکن کـە گومڕاییـان بـە ڕێنماییو ئازاریـان بـە لێبوردن کڕیـوە، ئـای چەند خۆڕاگرن لەسەر ئاگر! ﴿١٧٥﴾ ئەویش لە سۆنگەی ئـەوەوە کـە خـوا کـتێبی بـە هـەق ناردۆتـە خـوار، وە ئەوانـەی لـەبارەی کـتێب (ی خـوای بـەرز)ەوە کەوتوونـە ڕاجیایی یەوە، لـە دووبەرەکییەکـی دووردان ﴿١٧٦﴾ چـاکە ئەوەنیـە کـە ڕووی خۆتـان بکەنە لای ڕۆژهەڵاتو ڕۆژئـاوا، بەڵکو چاکە چاکەی کەسێکە بـڕوای بـە خـواو بـە ڕۆژی دوایـیو فریـشتانو کتێـبو پێغەمبـەران بێنـێو، مـاڵی خۆیـشی وێـڕای خۆشویستنیـشی بـە خزمـانو هـەتیوانو نـەدارانو ڕێبـوارانو سوالکـەرانو لـە ئازادکردنی کۆیلاندا ببەخشێ، وە نوێژ بەرپا بکاتو زەکات بدا، وە بەجێهێنەرانی پەیمـان کە پەیمانیانـدا، وە خۆڕاگران لـە حاڵەتی ئاتـاجییو نەخۆشییو لـە کـاتی جەنگدا، ئا ئەوانە کەسانێکن ڕاست دەکەنو ئەوانەن پارێزکاران ﴿١٧٧﴾)) .

## شـیکردنـەوەی هەندێـك لە وشـەکان

(بِٱلْحَقِّ): (أَصْلُ الحَقِّ المطابقة والموافقة)، واتە: وشەی (حق) لە ڕیشـەدا یانی پێکـەڵپێك بوونو گونجـان لەنێـوان ئەوەدا کە دەگـوترێو واقیعـدا.

(ٱلْبِرَّ): (البَـرُّ خِـلاَفُ البَحـر)، (بَـرّ) واتـە: وشکـانیی کـە پێـچەوانەی دەریـــایە، (والبِّـرُّ: تَوسُّـعٌ فـي فِعْـلِ الْخَـيْرِ وَهُـوَ صِـفَةَ الْخَـالق والخَلْـق)، (بِـرُّ) واتــە: چاکـەکردنێکی فراوان، ئەوە کە دەگونجێ هەم سـیفەتی خـوا بـێ وە یەکـێك لـە ناوەکـانی خوابـێ: ﴿ ... إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْبَرُّ ٱلرَّحِيمُ ﴿٢٨﴾ ﴾ الطـور، (البَـرّ) واتـە: چاکـەکـار، (البِـرّ) واتە: چاکـەکردن، وە هەم دەگونجێ سیفەتی ئینسـان بێ.

(وَٱلۡمُوفُونَ): (الوَافي: الّذي بَلَغَ التَّمَامَ) (الوَافي): واتە: شتێك كە تەواوبووبێ (وَأَوْفَى: إذَا تمَّ العَهْدَ وَلَمْ يَنْقُضْ حِفْظَهُ) واتە: پەیمانەكەی تەواوكردو هەڵینەوەشاندەوە، كەواتە: ﴿وَٱلۡمُوفُونَ بِعَهۡدِهِمۡ إِذَا عَٰهَدُواْ﴾، واتە: ئەوانەی كاتێ كە بەڵێن دەدەن بەڵێنەكەیان بەتەواویی جێبەجێ دەكەن.

(عَٰهَدُواْ): (العَهْدُ: حِفْظُ الشَّيءِ ومُرَاعَاتُهُ وَسُمِّيَ بالموثق لَما يلزم مرَاعاته) واتە: (عَهْد) بریتیە لە پاراستنی شتێك‌و چاودێرییكردنی، بۆیەش ناوی لێنراوە (موثق)، چونكە پێویستە چاودێریی بكرێ.

(ٱلۡبَأۡسَآءِ): (البؤس والبأس والبأساء: الشدَّة والمَكروه) هەمووی بە مانای تەنگانەو سەغڵەتیی دێ.

(وَٱلضَّرَّآءِ): لە (ضَرّ)ەوە هاتوە، (الضُّرُّ سوءُ الْحَالِ، والضَّرآء عَكْسُ السرآء)، (الضُّرُّ) واتە: حاڵی ناخۆش، پێچەوانەی (السرآء)ە، واتە: خۆشیی، وە (بأس) بە مانای تەنگاویی‌و ناخۆشیی دێ، وە بە مانای جەنگێك دێ كە ئینسان تێیدا دەكەوێتە تەنگانە.

## هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتەكان

١/ هۆی هاتنە خوارەوەی)- هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتەی كە دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكۡتُمُونَ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ مِنَ ٱلۡكِتَٰبِ وَيَشۡتَرُونَ﴾ {(أَخْرَجَ ابْنُ جَرِير الطّبَرِي عَن عِكرَمَة قَالَ: نَزَلَت في اليَهُود، وَأَخْرَجَ ابْنُ جَرير عَنِ السدي قَالَ: كَتَمُوا اسم مُحَمَّدٍ وَأَخَذُوا عَلَيهِ طَمَعَاً قَلِيلاً) (فَتحُ القَدِير، ج: (١)، ص: (٢٢٧)، وأسبَاب النزول للنيسابوري، ص: (٣٢)}، واتە: (إبْنُ جَرِير الطَبَري) لە عیكرِمەوە هێناویەتی دەڵێ: ئەوە دەربارەی

جوولەکەکان هاتۆتە خوارێ کە ئایەتەکانی خوای پەروەردگاریان دەشاردەوە کاتێ باسی موحەممەدیان دەکرد ﷺ وە خەڵکیان چەواشە دەکرد لە بەرانبەر بەرژەوەندییەکی کەمدا.

٢/ هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتەی، کە دەفەرموێ: ﴿ لَّيْسَ ٱلْبِرَّ أَن تُوَلُّوا۟ وُجُوهَكُمْ قِبَلَ ٱلْمَشْرِقِ وَٱلْمَغْرِبِ ﴾.

أ- {(أخرَجَ ابْنُ جَرِير وابْنُ المُنذِر عَنْ قَتَادَةَ قَالَ: ذُكِرَ لَنَا أَنَّ رَجُلاً سَأَلَ النَّبِيَّ ﷺ عَنِ البِرِّ فَأَنزَلَ اللهُ هَذِهِ الآية) (أسباب النزول للنيسابوري، ص (٣٣)}، واتە: پیاوێك پرسیاری لە پێغەمبەر ﷺ کردوە دەربارەی چاکەکاریی، خوای پەروەردگار ئەم ئایەتەی ناردە خوارێ، کە پێناسەی چاکەکاریی تێدایە.

ب- {(وأخرَجَ إبْنُ جَرِير وعَبدُ الرَّزَاق عَنْ قَتَادَةَ قَالَ: كَانَتِ اليَهُود تصلّي قِبَلَ المَغرِب والنَّصَارى قِبَلَ المَشرِقِ) (فَتحُ القَدِير للشَوكاني، ج (١)، ص (٢٢٩)}، واتە: (إبْنُ جَرِير و عَبدُ الرَّزَاق) لە قەتادەوە هێناویانە دەڵێ: جوولەکەکان بەرەو ڕۆژئاوا نوێژیان دەکرد، وە نەصرانیی یەکان بەرەو ڕۆژهەڵات، خوا ﷻ ئەم ئایەتەی ناردە خوارێ: ﴿ لَّيْسَ ٱلْبِرَّ أَن تُوَلُّوا۟ وُجُوهَكُمْ قِبَلَ ٱلْمَشْرِقِ وَٱلْمَغْرِبِ ﴾، واتە: چاکەکاریی ئەوە نیە ڕوو لە ڕۆژهەڵات بکەن‌و ڕوو لە ڕۆژئاوا بکەن، {ئەی جوولەکەو نەصرانیی یەکان}، بەڵکو چاکەکاریی‌و دینداریی ئەوەیە کە لەم ئایەتەدا هاتوە.

## مانای گشتی ئایەتەکان

خوا ﷻ جارێکی دی دێتەوە سەر باسی ئەو تاوانە گەورەی شاردنەوەی ئایەتەکانی خوا، کە دیارە وەك لە هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتەکاندا باسمان کرد، زۆر لە توێژەرەوانی پێیان وایە دەربارەی خاوەن کتێبەکان هاتۆتە خوارێ،

کە سیفەتەکانی پێغەمبەری کۆتایی خوا (موحەممەد) ﷺ یان دەشاردەوە لە کتێبەکانیاندا، لە بەرانبەر هەندێ بەرژەوەندیی دنیاییدا، کە بریتی بووە لەوەی ئەو بەزمو بازارەی بۆیان ساز بووە، بەهۆی ئەو دینە تێکدراوەی خۆیانەوە، لێیان تێك نەچێ، هەروەك زۆرجار لەنێو مسوڵمانانیشدا کەسانێك دەبن کە لە بەرگی دیندا بەزمو بازارێکیان لەسەر بناغەی درۆو دەلەسەو ئەفسانە پێکهێناوە هیچ پەیوەندیی بە دینو ئیسلامو بە قورئانو سوننەتەوە نیەو، هەر لەبەر ئەوە ئەو بیدعەتو ئەفسانەو داهێنراوەی خۆیان دەست پێوە دەگرن، چونکە بەرژەوەندیی خۆیانی تێدا دەبیننەوە، هەرچەندە دەشزانن لەسەر ناهەقن! کە لە ڕاستیدا ئەم ئایەتانە، ئەگەر هۆی هاتنە خوارەوەکەشیان تایبەت بووبێ‌و، مەبەستی پێ خاوەن کتێبەکان بووبێ، بەڵام وەك زانایان گوتوویانە: ((العِبرَة بعمومِ المَعنى ولَيسَت بخصوصِ السَبَب)) خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكْتُمُونَ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ مِنَ ٱلْكِتَٰبِ وَيَشْتَرُونَ بِهِۦ ثَمَنًا قَلِيلًا ﴾، بەڕاستی ئەوانەی ئەوە کە خوا لە کتێبی خۆیدا ناردوویەتە خوار دەیشارنەوە و پەنهانی دەکەن، وە نرخێکی کەمی پێدەکڕن ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ مَا يَأْكُلُونَ فِى بُطُونِهِمْ إِلَّا ٱلنَّارَ وَلَا يُكَلِّمُهُمُ ٱللَّهُ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ﴾، ئەوانە لە زگی خۆیاندا جگە لە ئاگر شتێکی دی ناخۆن، وە لە ڕۆژی دواییدا خوا نایاندوێنێ ﴿ وَلَا يُزَكِّيهِمْ ﴾، وە تەزکیەیان ناکات، واتە: نە پاکیان دەکاتو نە چاکیان دەکات ﴿ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴾، وە ئازارێکی بەئێشیان هەیە ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ ٱشْتَرَوُاْ ٱلضَّلَٰلَةَ بِٱلْهُدَىٰ ﴾، ئەوانە کەسانێکن گومڕاییان بە ڕێنمایی کڕیوە، ئەو گومڕاییەی کە بریتیە لە شاردنەوەی ئایەتەکانی خواو، بریتیە لە مانەوە لەسەر دینێکی تێکدراو (مُحَرَّف)، یاخود بریتیە لە چەواشەکردنی خەڵك بەهۆی شاردنەوەی ئایەتەکانی خواوە، ئەوەیان کڕیوە بە ڕێنمایی خوا، بەو ڕێنماییو ڕێ ڕۆشنییەی کە دەیزانن ﴿ وَٱلْعَذَابَ بِٱلْمَغْفِرَةِ ﴾، وە بە لێبوردنی خوا سزاو ئازارو

ئەشکەنجەی دوا ڕۆژیان بۆ خۆیان کڕیوەو مسۆگەر کردوە ﴿ فَمَآ أَصْبَرَهُمْ عَلَى ٱلنَّارِ ﴾، خوا ﷻ دەفەرموێ: سەرتان سوڕبمێنێ خەڵکینە! ئەوانە چەند خۆڕاگرن لەسەر ئاگر! واتە: کە دەزانن سەرەنجامی ئەو کردەوەو هەڵوێستانەیان ئەو ڕەفتارانەیان بریتیە لە چوونە دۆزەخ، وا دیارە زۆر بە تەحەممولن‌و زۆر لەخۆڕادەبینن کە لەسەر ئاگر خۆڕاگربن، بۆیە وابێ دەربەستن!! ﴿ ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ نَزَّلَ ٱلْكِتَٰبَ بِٱلْحَقِّ ﴾، ئەو سزا سەختەشیان لەبەر ئەوەیە کە خوا کتێبی خۆی بەهەق ناردۆتە خوار، هەقی تێدایەو بە هەق هاتوەو بۆ چەسپاندنی هەق هاتوە ﴿ وَإِنَّ ٱلَّذِينَ ٱخْتَلَفُوا۟ فِى ٱلْكِتَٰبِ لَفِى شِقَاقٍۭ بَعِيدٍ ﴾، وە ئەوانەی دەربارەی کتێبی خوا کەوتوونە ڕاجیایی یەوەو، بڕوای پێ ناهێنن‌و تێیدا کەوتوونەتە کێشەو مشتومڕەوە، ئەوانە لە دووبەرەکییەکی دوور دان، واتە: زۆر دوورکەوتوونەتەوە لە خواو لە دژایەتیکردنی خوادا زۆر دوور کەوتوونەتەوەو زۆر ڕۆیشتوون. لێرە مەبەست پێی هەرکەسێکە ئایەتەکانی خوا کە ناردوونیە خوار، چ کتێبەکانی پێش پێغەمبەری کۆتایی ﷺ، وە چ ئەو کتێبەی کە بۆ پێغەمبەری کۆتایی هاتوە، ﷺ وەچ هەرکەسێك ئەو ڕاستییانە کە خوا بۆ بەندەکانی ناردوون، بۆ ئەوەی بەرچاویان ڕۆشن بێ‌و بیکەنە بەرنامەی ژیانیان، بیشارنەوە ژێر لێوی بخەن‌و پەنهانی بکەن‌و ڕاینەگەیەنن، لە بەرانبەر ئەوەدا کە تەماع‌و بەرژەوەندییەکیان دەستدەکەوێ، وە لەڕاستیدا ئەوە هەموو ئەوانە دەگرێتەوەو ئەو سزا سەختانە تایبەت نین بە خاوەن کتێبەکانەوە، بەڵکو مسوڵمانیش دەگرنەوە، ئنجا دەربارەی ئەوە کە چاکەکار کێیەو چاکە چییە؟ دەفەرموێ: ﴿ لَّيْسَ ٱلْبِرَّ أَن تُوَلُّوا۟ وُجُوهَكُمْ قِبَلَ ٱلْمَشْرِقِ وَٱلْمَغْرِبِ ﴾، چاکەکاریی واتە: دینداریی‌و چاك بوون لای خوا، ئەوەنییە کە ڕوو لە ڕۆژهەڵات‌و ڕۆژئاوا بکەن، ئەوە دەگونجێ مەبەست پێی جوولەکەو نەصرانییەکان بێت، یاخود مەبەست پێی مسوڵمانان بێ، چونکە هەندێك لە توێژەرەوانی قورئان دەڵێن: مسوڵمانان کە خوا ڕووی پێکردنە کەعبە،

گوتوویانە: تازە لێبووینەوە مادام ڕوو لە کەعبە دەکەین، مانای وایە لە هەموو کەس چاکترین! جا خوای مەزن سەرنجیان بۆ ئەوە ڕادەکێشێ کە خۆتان فریو مەدەن، چاکەکاریی هەر ڕوو لە قیبلەکردن نیە ﴿وَلَٰكِنَّ ٱلْبِرَّ مَنْ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةِ وَٱلْكِتَٰبِ وَٱلنَّبِيِّۦنَ﴾، بەڵکو چاکەکاریی بریتیە لە چاکەی کەسێك کە ئیمان بێنێ بە خواو بە ڕۆژی دوایی‌و بە فریشتان‌و بە کتێب (واتە: کتێبەکانی هەموو پێغەمبەران) وە بە هەموو پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام)، ئەوە پایەکانی ئیمان‌و عەقیدە، ئنجا وەك بەزەیی نواندن‌و بەخشش‌و چاکەکاریی لەگەڵ خەڵك، دەفەرموێ: ﴿وَءَاتَى ٱلْمَالَ عَلَىٰ حُبِّهِۦ﴾،ماڵ‌و سامانێك کە زۆریشی خۆشدەوێ، (لەبەر ئەوەی یان زۆری پێویست پێیەتی، یاخود کاتەکە کاتێکی گرانییە) دەیبەخشێ بە: ﴿ذَوِى ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْيَتَٰمَىٰ وَٱلْمَسَٰكِينَ وَٱبْنَ ٱلسَّبِيلِ وَٱلسَّآئِلِينَ وَفِى ٱلرِّقَابِ﴾، خزمان‌و هەتیوان‌و نەداران‌و ڕێبواران {یاخود میوان} و سواڵکەران، وە بۆ ئازادکردنی ئەوانەی کە کۆیلەن، ئنجا ﴿وَأَقَامَ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَى ٱلزَّكَوٰةَ﴾، (وە چاکەکار) کەسێکە نوێژ بەرپا بکاو زەکات بدا، بۆیەش نوێژو زەکاتی دواخستوون، بۆ ئەوەی وا نەزانرێ کە دین لە نوێژو زەکاتدا (خولاسە) دەبێتەوە، بەڵکو پێش نوێژو زەکاتدا زۆر شتی دیکە هەیە، ئنجا دەفەرموێ: ﴿وَٱلْمُوفُونَ بِعَهْدِهِمْ إِذَا عَٰهَدُوا۟﴾، وە بەڵێن جێبەجێکەران، کاتێ پەیمان دەدەن، پەیمان جێبەجێ دەکەن.﴿وَٱلصَّٰبِرِينَ فِى ٱلْبَأْسَآءِ وَٱلضَّرَّآءِ وَحِينَ ٱلْبَأْسِ﴾، وە خۆڕاگران لەکاتی هەژاریی‌و نەداریی‌و لەکاتی نەخۆشیی‌و لەکاتی تەنگانەو سەغڵەتییدا بە تایبەتی کاتی جەنگ ﴿أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ صَدَقُوا۟ وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُتَّقُونَ﴾، ئا ئەوانە ڕاست دەکەن لە مسوڵمانەتیی‌و چاکەکارییاندا، وە ئا ئەوانەشن پارێزکاران، خوا لەو کەسانەمان بگێڕێ.

## چەند مەسەلەیەکی گرنگ

**مەسەلەی یەکەم:** خوا ﷻ چوار جۆرە سزای باسکردوون بۆ کەسانێك کە ئەوەی خوا لە کتێبی خۆیدا ڕوونیکردۆتەوەو ناردوویەتە خوار، پەنهانی دەکەن‌و دەیشارنەوە، کە وەك لە دەرسی ڕابردوودا گوتمان، ئەوە چ مەبەست پێی ئەو خاوەن کتێبانەبن کە سیفەتەکانی پێغەمبەری کۆتایی ﷺ {موحەممەدی کوڕی عەبدوڵلا} کە لە کتێبەکانیاندا باسکرا بوون، دەیانشاردنەوە، وە چ مەبەست پێی هەر زانایەك بێ کە ئایەتەکانی خوا دەشارێتەوە لە خەڵك، ڕاستییەکانی دینی خوا بە خەڵك ناڵێ‌و، یاساکانی شەرع ژێر لێو دەخات، یاخود دەیانگۆڕێ، وەك گوتمان مەفهووم‌و واتاکەی گشتیی‌و فراوانە هەموو ئەوانە دەگرێتەوە، کە دینی خوا لە خەڵك دەشارنەوەو خەڵك چەواشە دەکەن، ئەو جۆرە کەسانە خوا ﷻ چوار جۆرە سزای بۆ ئامادە کردوون:

**سزای یەکەم،** دەفەرموێ: ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ مَا يَأْكُلُونَ فِي بُطُونِهِمْ إِلَّا ٱلنَّارَ ﴾، ئەوانە لە زگیاندا تەنیا ئاگر دەخۆن، واتە: ئەو تەماع‌و خواردن خۆراکەی کە دەستیان دەکەوێ لە بەرانبەر ئەو ئایەت شاردنەوەو ئەو ڕاستی شاردنەوەیەدا، بریتیە لە ئاگرێك کە لە دوارۆژدا دەیخەنە ورگی خۆیانەوە، واتە ئەو تەماع‌و خواردنەی کە دەستیان دەکەوێ، لەڕاستیدا ئەوە ئاگرێکە لە دوارۆژدا دەچێتە ورگیانەوە.

**سزای دووەم،** دەفەرموێ: ﴿ وَلَا يُكَلِّمُهُمُ ٱللَّهُ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ﴾، لە ڕۆژی هەڵسانەوەدا لە ڕۆژی قیامەتدا، خوا نایاندوێنێ، یەکێك بۆی هەیە بپرسێ: ئەدی بۆچی لە هەندێ شوێندا خوا ﷻ باسی دواندنیان دەکات: ﴿ فَلَنَسْـَٔلَنَّ ٱلَّذِينَ أُرْسِلَ إِلَيْهِمْ وَلَنَسْـَٔلَنَّ ٱلْمُرْسَلِينَ ۝٦ ﴾ الأعراف، واتە: بە تەئکید دەپرسین لەوانەی کە پێغەمبەرانیان بۆ ڕەوانە کراوە، وە لە ڕەوانەکراوانیش

دەپرسین، هەروەها لە هەندێ شوێنی دیکەدا خوا ﷻ دەفەرموێ و لێیان دەپرسینەوە ﴿ ثُمَّ لَتُسْـَٔلُنَّ يَوْمَئِذٍ عَنِ ٱلنَّعِيمِ ﴿٨﴾ ﴾التكاثر، واتە: پاشان لەو ڕۆژەدا دەربارەی نیعمەتەکان لێتان دەپرسرێتەوە؟! لە وەڵامدا دەڵێین: لێرەدا مەبەست پێی ئەوەیە کە خوا ﷻ بە شێوەی لوتف و بەزەیی لەگەڵ نواندن و دڵخۆش کردن، نایاندوێنێ، وە ئەگەر بەشێوەی تێوەخوڕین و بەشێوەی لێ تووڕەبوون و سەرزەنشتکردن، بیاندوێنێ، ئەوە خۆی جۆرێکە لە سزا، هەرچەندە دەشگونجێ ئەو شێوە دواندنانەی سەرزەنشت و تێوەخوڕین و لێپرسینەوە، خوا ﷻ خۆی ڕاستەوخۆ لەگەڵ بەندەکانیدا نەیکات، بەڵکو فریشتەکانی بیکەن، چونکە خوا ﷻ هەندێ شت کە فریشتەکانی ئەنجامی دەدەن، بە کردەوەی خۆی دایدەنێ، لە سۆنگەی ئەوەوە کە ئەو فریشتانە لە فەرمانی خوا دەرناچن.

**سزای سێیەم،** دەفەرموێ: ﴿ وَلَا يُزَكِّيهِمْ ﴾، تەزکیەیان ناکات، تەزکیە هەم بە مانای پاکبوونەوە دێ و، هەم بە مانای چاکبوون دێ و، هەم بە مانای گەشەکردنیش دێ، واتە: خوا نە پاکیان دەکات و، نە چاکیان دەکات و، نە گەشەیان پێ دەدات.

**سزای چوارەم،** دەفەرموێ: ﴿ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴾، وە ئازارێکی بەئێشیان هەیە، کەواتە: لێرە بۆمان دەردەکەوێ کە بەڕاستی شاردنەوەی ڕاستییەکانی دینی خواو گۆڕینی یاساکانی شەریعەت، کە دەبێتە هۆی چەواشەبوونی خەڵک و سەرلێشێوانی خەڵک، گوناهێکی یەکجار گەورەیە و، ئەگەر بڵێین: لە دوای کوفرو هاوبەش بۆ خوا پەیداکردن، گوناح لەوە گەورەتر نیە، زێدەڕۆییمان نەکردوە.

**مەسەلەی دووەم:** ئەوەیە کە خوا ﷻ هەم لێرەو هەم لە ئایەتەکانی پێشتری ئەم سوورەتی (البقرة)یەدا، لە چەند شوێنێکدا کە باسی ئەوانە دەکات کە ئایەتەکانی خوا دەشارنەوە، یاخود ئایەتەکانی خوا دەگۆڕن، دەفەرموێ:

﴿ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ ٱشۡتَرَوُاْ ٱلضَّلَٰلَةَ بِٱلۡهُدَىٰ ﴾، ئەوانە کەسانێکن گومڕاییان کڕیوە بە ڕێنمایی، یانی: لێرەدا خوا ﷻ ئەوانە وەك بازرگانێك تەماشا دەکات کە سەوداو مامەڵەو بازرگانیی دەکات ! بۆیە من لە کتێبەکانی خۆمدا، وە لە زۆر لە وتارەکانمدا کە باسی ئەو جۆرە بەناو زانایانەم کردوە، گوتوومە: لەڕاستیدا ئەوانە کۆلکە مەلای دین فرۆشن، چونکە ئەوانە بە عەقڵێکی بازرگانیی (تجاري) بیردەکەنەوە، وا بیردەکەنەوە کە چۆنیان بەرژەوەندیی زیاتر بۆ دابین دەبیٚ‌و، چۆن زیاتر قازانجی ماددییان دێتە دەستی؟ یانی: لەڕاستیدا ئەوانە بازرگانن، بەندەی خوا نین‌و زانانین‌و پێشەوا نین، چونکە: زانایان‌و پێشەوایان‌و بەندە بۆ خوا صوڵحاوەکان، بە عەقڵی بازرگانیی‌و سەوداو مامەڵە بیرناکەنەوە، کە چۆن پارەیان زیاتر دێتە دەست‌و چۆن بەرژەوەندیی ماددییان زیاتر بۆ دابین دەبێت؟ بەڵکو وا بیردەکەنەوە کە خوا چۆن لێیان ڕازی دەبیٚ‌و چۆن لە دواڕۆژدا زیاتر سەربەرز دەبن‌و چۆن بەهەشتیان زیاتر دەست دەکەویٚ ! نەك لە دنیادا، چۆن پارووی چەورترو شوێنی نەرمترو ژیانی خۆشتریان بۆ فەراهەم دەبیٚ‌و دەستگیر دەبیٚ!

**مەسەلەی سێیەم:** خوا ﷻ دوو هۆکار باس دەکات، کە بۆچی ئەو سزاو ئازارە سەختە بە باڵای ئەو جۆرە کەسانە بڕاوە، دەفەرمویٚ: ﴿ ذَٰلِكَ ﴾، واتە: ئەو سزایە بۆیەیە:

**هۆکاری یەکەم:** ﴿ بِأَنَّ ٱللَّهَ نَزَّلَ ٱلۡكِتَٰبَ بِٱلۡحَقِّ ﴾، لەبەر ئەوەی کە خوا کتێبی خۆی بەهەق ناردۆتە خوار، هەم بە شێوەی هەق هاتوە، لەکاتی خۆی‌و لە شوێنی خۆیداو، هەر ئایەتە لەجێی خۆی لە شوێنیداو، هەر وەڵامە بۆ پرسیاری خۆی، وە پاشان هەقی گرتۆتە نێوخۆی، وە هەقیش دەچەسپێنیٚ، ئەگەر ئەم کتێبەی خواو ئەم بەرنامەیەی خوا ئیشی پێبکریٚ، هەق دەچەسپیٚ‌و لە چەسپینی هەقیشدا هەموو کەس قازانج دەکات، جگە لە ئەهلی باطڵ، بۆیە ئەوانەی ئەو هەقە دەشارنەوە کە خوا لە کتێبی خۆیدا ناردوویەتە خوار، مانای وایە شایستەی ئەوەن بەو شێوەیە سزا بدرێن.

**هۆكاری دووەم:** ﴿ وَإِنَّ ٱلَّذِينَ ٱخۡتَلَفُواْ فِي ٱلۡكِتَٰبِ لَفِي شِقَاقِۭ بَعِيدٖ ﴾، وە ئەوانەش كە دەربارەی كتێبی خوا كەوتوونەتە ڕاجیاییو مشتومڕەوەو بڕوای پێناكەن، ئەوانە لە دووبەرەكییەكی زۆر دووردانو، ئەوانە زۆر لە خوا دووركەوتوونەتەوەو، بەربەرەكانێی دینی خوا دەكەن، بۆیە شایستەی ئەوەن بەو شێوەیە سزا بدرێن.

**مەسەلەی چوارەم:** ئەم ئایەتی (١٧٧)ی سوورەتی (البقرة)، كە بە ئایەتی (البِرّ) ناسراوە، ئایەتێكە زانایانی ئیسلام لە كتێبەكانی خۆیاندا بایەخو گرنگییەكی زۆریان پێداوە، هەم لە تەفسیرەكانیانو هەم لە سەرجەم كتێبەكانیاندا، چونكە بەڕاستی ئەم ئایەتە ئایەتێكی زۆر كۆكەرەوەیەو بەڕاستی پێناسەیەكی زۆر چاك بۆ ئینسانی چاكەكارو ئینسانی دیندارو مسوڵمان دەكات، كە دەبێت چۆن بێو بە گشتی شەش (٦) شتان دەگرێتە نێوخۆی:

**یەكەم/** پێنج پایەكانی ئیمان، كە بریتین لە: ئیمان بە خواو بە ڕۆژی دواییو بە فریشتەكانو بە كتێب (كتێبەكانی خوا)و بە پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام).

**دووەم/** ماڵ بەخشین بە توێژە ئاتاجو پەككەوتەكانی كۆمەڵگا: خزمانو هەتیوانو نەدارانو ڕێبوارو لێقەوماوانو سواڵكەرانو ئەو كۆیلانەی، كە دەبێ ئازاد بكرێن، كە كاتی خۆی بوو ون.

**سێیەم/** نوێژ بەرپاكردن.

**چوارەم/** زەكاتدان.

**پێنجەم/** وەفا بە بەڵێن پەیمان.

**شەشەم/** خۆڕاگرتن لە هەموو بوارەكاندا، لێرەدا خوا ﷻ سەرنجی مسوڵمانان ڕادەكێشێ دەفەرموێ: ﴿ لَّيۡسَ ٱلۡبِرَّ أَن تُوَلُّواْ وُجُوهَكُمۡ قِبَلَ ٱلۡمَشۡرِقِ وَٱلۡمَغۡرِبِ ﴾، سەرنجمان ڕادەكێشێ بۆ كاكڵەو جەوهەری دین بۆ شتی بناغەییو بنەڕەتی لە دینداریدا، تاكو نەچین هەر خۆمان بە شتی ڕوواڵەتییو ڕووكەشیی یەوە

خەریك نەكەین‌و نەچین هەموو تواناو كۆششی خۆمان نەخەینە سەر ئەو شتانەی كە ڕواڵەتیین، یاخود لە دیندا حاڵەتێكی لاوەكییان هەیە، نەك حاڵەتی بنەڕەتیی‌و بناغەیی ﴿ لَّيْسَ ٱلْبِرَّ أَن تُوَلُّوا۟ وُجُوهَكُمْ قِبَلَ ٱلْمَشْرِقِ وَٱلْمَغْرِبِ ﴾، چاكەكاریی ئەوە نیە ڕووی خۆتان بكەنە ڕۆژهەڵات‌و ڕۆژئاوا (كە وەك پێشتر گوتم) ئەوە دەگونجێ مەبەست پێی جوولەكەو نەصرانییەكان بێت، كە مەسەلەی قیبلەیان كردبوو بە شتێكی زۆر گەورەو دەشگونجێ مەبەست پێی مسوڵمانانیش بێ، چونكە هەندێك لە مسوڵمانانیش بیركردنەوەی وایان هەبووەو، هەندێك كە دیارە سادە بوو ون لە دینداریيەكەياندا، گوتوویانە: مادام ئێمە ڕوو دەكەینە كەعبەو ڕوو دەكەینە مزگەوتی حەڕام، مانای وایە لە هەموو ئاوان پەڕیوینەوەو، لە هەموو كەس چاكترین ! جا خوای زانا هۆشیارو بێداری كردنەوە كە نەخێر دینداریی‌و مسوڵمانەتیی لێرەدا تەواو نابێت‌و بەوەندە كۆتایی نایەت، بەڵكو دینداریی‌و مسوڵمانەتیی شتی زۆر بنەڕەتیی ترو بناغەییتری هەیە، كە بریتین لەو شتانەی خوای بە بەزەیی خستوونیە ڕوو. هەڵبەتە ئێستاش هەر وایەو گەلێك جار دەبینی مسوڵمانێك، جا پیاوە، ئافرەتە، مەلایە، شێخە، گەنجە، پیرە، خاوەن دەسەڵاتێكە، نەدارێكە، هەرچین‌و توێژێكە تەماشا دەكەی خۆی بە هەندێ شتەوە سەرقاڵ كردوە، كە پێی وایە زۆر شتی گرنگن، بەڵام ڕەنگە لە دینداریی‌و مسوڵمانەتییدا ئەو شتانەی ئەو خۆی پێوە مشەوەش‌و سەرقاڵ كردوون، شتی لەوان گەورەترو گرنگترو لە پێشتر هەبێ !! بۆیە دەبێ ئاگامان لەوەبێ كە تەرازووو پێوەری ئێمە بۆ گرنگ‌و گرنگترو گەورەو گەورەترو چاك‌و چاكتر لە دینداریی‌و مسوڵمانەتییدا قورئان‌و سوننەتە، تەماشا بكە قورئان بە زۆری باسی چی كردوە، ئەوە بزانە ئەو شتە زۆر گرنگە لە دینداریيدا، وە بزانە بە زۆری فەرمانی بە چی كردوە، بزانە كە ئەوە گرنگترە لە دینداریيدا، وە چ شتێ یەكجاری باسكردوە، بزانە كە لە قەدەر ئەو یەكجارە گرنگی هەیە، بۆ نموونە: لە چەندان شوێندا خوا باسی

ئیمانو عەقیدەی کردوە، وە باسی عیبادەتی خۆی کردوە، کە تەنیا دەبێ ئەو بەندایەتیی بۆ بکرێ، وە لە چەندان شوێنـدا باسی تەقوای کردوە، وە لە چەندان شوێنـدا باسی ماڵ بەخشینی کردوە، وە لە چەندان شوێنـدا باسی وەفاداری کردوە، وە لە چەندان شوێنـدا باسی خۆڕاگریی کردوەو، باسی جەنگو جیهادی کردوەو باسی خۆبەختکردنو سەرو ماڵ فیداکردنی کردوە لەپێناو خوادا، وە لە چەندان جێگەدا باسی صیلەی ڕەحمو خزمایەتی کردوە، کەواتە: هەر کام لەو شتانە بە ئەندازەی ئەوە کە خوا لە قورئاندا باسی کردوون، بە ئەندازەی ئەوە گرنگیی و بایەخیان هەیە، بەڵام شتێك کە ڕەنگە لە یەك ئایەتـدا باس نەکرابێ، تۆ نابێ لەخۆتی بکەی بە هەموو شتێك، بۆ وێنە: ئاهەنگگێڕان بەبۆنەی لەدایکبوونی پێغەمبەر (محمد المصطفى)وە ﷺ، کە من بۆ خۆم ئەو مەسەلەیە لە جۆری هەڵسوکەوتەکان دەبینمو لە بازنەی هەڵسووکەوتەکانیشدا تەماشای بەرژەوەندیی و خراپە (مَصْلَحَة و مَفْسدة) دەکرێو سەرنجی نێوەرۆکی شتەکان دەدرێ، کە ئایا ناشەرعییان تێدایە یان نا ؟ وە من یادکردنەوەی لەدایکبوونی پێغەمبەر ﷺ بەجۆرێك لە عیبادەت تەماشا ناکەم تا بگوترێ: حوکمی بیدعەتی دێتە سەرێ، چونکە زانایانی ئیسلام دەڵێن: بیدعەت لە عەقیدەو لە عیبادەت دایە، بەڵام لە هەڵسوکەوتەکانو عادەتەکاندا ئەسڵ دەستی کراوەیی یە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا تەماشا دەکەی هی وا هەیە هەر بەتەمای ئەوە لە خۆی گەڕاوە، کە ساڵانە ئاهەنگ دەگێڕێ بەبۆنەی لەدایکبوونی پێغەمبەرەوە ﷺ، یان هەر شتێکی دیکەی لەو بابەتە، بۆ وێنە: چوونە عومرە یان حەجکردنی سوننەت، جا بێگومان حەج یەکێکە لە پایەکانی ئیسلام (حەجی فەرز)، بەڵام هەر بەقەدەر خۆی گرنگەو حەج کەلێنی شتەکانی دیکە ناگرێ، یان زۆر کەس لە ڕەمەزاندا تەماشا دەکەی ڕۆژووی ڕەمەزان دەگرێو نوێژیش دەکاتو خۆی لە گوناهان دەپارێزێ، کەچی دوایی کە ڕەمەزان بەسەردەچێ، دەچێتەوە سەر بەزمی پێشێی ! باشە ڕەمەزان گرنگەو گرتنی ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان یەکێکە لە پێنج پایەکانی

ئیسلام (مسوڵمانەتیی‌و دینداریی شەخصیی)، بەڵام هەر بەقەدەر خۆی گرنگەو وە نەبێت مانگی ڕەمەزان کەلێنی مانگەکانی دیکە بگرێ، وە ڕۆژوو گرتنی مانگی ڕەمەزان کەلێنی ئەرکە شەرعییەکانی دیکە پڕناکاتەوە.

**مەسەلەی پێنجەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ وَلَٰكِنَّ ٱلْبِرَّ مَنْ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةِ وَٱلْكِتَٰبِ وَٱلنَّبِيِّۦنَ ﴾ باسی پێنج پایەکان دەکات، لە پایەکانی ئیمان، ئیمان بە خواو بە ڕۆژی دوایی‌و بە فریشتەکان‌و بە کتێب (کتێبەکان)، وە بە پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام)، وە ئیمان بە قەدەری تێدا نیە، کە لە فەرمایشتی پێغەمبەر ﷺ داهاتوە، کە لە (صحیح)ی بوخاریی‌و موسلیم دایەو بە فەرموودەی جیبریل بەناوبانگە، چونکە جیبریل خۆی بردە سەر شێوەی پیاوێك‌و پرسیاری لە پێغەمبەر ﷺ کرد، کاتێك کە لە جەنگی تەبووك بوون دەربارەی: ئیمان‌و ئیسلام‌و ئیحسان، وە پێغەمبەر ﷺ دوایی فەرمووی: ئەوە جیبریل بوو هاتبوو دینەکەتان پێبناسێنێ، جا لەوێدا باسی ئیمان بە قەدەریش دەکات[1]، ئەگەرنا (قەزاو قەدەر) لە هیچ شوێنێکی قورئاندا باسی نەکراوە، کە بەشێك بێت لە ئیمان، چونکە ئیمان بە قەدەر بریتیە: لە ئیمان بە زانیاری خواو بە توانای خواو بە ویستی خواو بە حیکمەت‌و دادگەریی خوا، کەواتە: ئیمان بە خوا، ئیمان بە قەدەریشی تێدایە، بۆیە باسی نەکردوەو لە ئایەتەکاندا نەهاتوە.

**مەسەلەی شەشەم:** کە دێتە سەر باسی ماڵ بەخشین، شەش جۆرە کەسان باس دەکات‌و سەرەتا ئاوا دەفەرموێ: ﴿ وَءَاتَى ٱلْمَالَ عَلَىٰ حُبِّهِۦ ﴾، ماڵەکەی دەبەخشێ لەگەڵ خۆشویستنیدا، کە ئەمە سێ مانای هەن:

**یەکەم:** واتە: لەگەڵ خۆشویستنی خواداو لەبەر خۆشویستنی خوا ماڵەکەی دەبەخشێ بە خزمان‌و هەتیوان‌و نەداران ... تا دوایی.

---

١) کە بەم شێوەیە: (... قال: فأخبرني عن الإيمان ! قال: أن تؤمن بالله و ملائكته و كتبه و رسله واليوم الآخر وتؤمن بالقدر خَيْرِهِ وشرِّه) رواه البخاري : (٥٠) و مسلم: (٨).

**دووەم:** یاخود لەگەڵ خۆشویستنیدا بۆ بەخشین، واتە: پێی خۆشە بیبەخشێو لەبەر ئەوەی خوا بەخشەرانی خۆشدەوێ، بۆیە ماڵەکەی دەبەخشێ.

**سێیەم:** یاخود لەگەڵ خۆشویستنی ماڵەکەشیداو هەرچەندە ماڵەکەی خۆشدەوێ، بەڵام هەر دەیبەخشێ لە پێناوی خوادا، چونکە خوای خۆشتر دەوێ لە ماڵەکەی، بۆیە ئامادەیە ماڵو سامانەکەی ببەخشێ لە پێناو خوایەکدا کە ماڵەکەی داوەتێ، وە خوا لە بەرانبەر ئەو ماڵ بەخشینەدا پاداشتێکی دەداتێ زۆر زۆر چاکترو زیاتر لەوەی کە دەیبەخشێ، ئنجا پرسیار لە پێغەمبەر ﷺ کراوە کە چ جۆرە ماڵ بەخشینو خێرکردنێك چاکترە گەورەترە ؟! فەرموویەتی: {(أَنْ تَصَدَّقَ وَأَنْتَ صَحِيحٌ شَحِيحٌ، تَخْشَى الْفَقْرَ وَتَأْمُلُ الْغِنَى، وَلاَ تُمْهِلْ حَتَّى إِذَا بَلَغَتِ الْحُلْقُومَ، قُلْتَ: لِفُلاَنٍ كَذَا، وَلِفُلاَنٍ كَذَا، أَلاَ وَقَدْ كَانَ لِفُلاَنٍ) (رَوَاهُ الْبُخَارِيُّ برقم: (١٤١٩)، وَمُسْلِم برقم: (٢٣٧٩)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٢٨٦٥)، وَالنَّسَائِيُّ برقم: (٢٥٤١) وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٣٣١٢)، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه}، واتە: باشترین ماڵ بەخشین ئەوەیە: کە تۆ خێرو چاکە بکەی لە حاڵێکدا کە تۆ ساغی وە ماڵەکەشت خۆشدەوێ، لەبەر ئەوەی زۆرت پێویستی پێیە، وە بە ئومێدی دەوڵەمەندبوونیو لە نەدارییش دەترسێی (لەبەر ئەوەی هەلو مەرجەکە دژوارە) نەك لێ بگەڕێی هەتا ڕووح دەگاتە گەروو، ئەوکاتە بڵێی: ئەوەندە بۆ فلانکەسو ئەوەندەش بۆ فلانکەس، چونکە تازە هەر بۆتە هی فلانو فیسار، (واتە: بۆتە میرات)، واتە: کاتێك کە ئەو هۆکارانە کۆبنەوە، ئنجا ماڵ بەخشینەکە پاداشتێکی زۆر گەورەی هەیە.

**یەکەم:** لەش ساغ بی، نەك بکەویە گیانەڵاو نیشانەی مردنت لێ دەربکەوێ، ئنجا بێنی ماڵەکەت ببەخشی !

**دووەم:** ئنجا نەك زۆر زۆر دەوڵەمەندبیو هیچ پەکت پێ نەکەوێ، بەڵکو بۆخۆت پێویستیت پێی هەبێ ئەوجار بیبەخشی، مەبەست لە (شَحِيحٌ) ئەوەیە.

**سێیەم:** (تَخشَى الفَقْـرَ وَتـأَمُلُ الغِـنَى) دەوڵەمەنـدییو بێنیـازییت پـێ خۆشـبێو لە نەدارییش بترسێی، لەبەر ئەوەی هەلو مەرجەکە سەختو دژوارە، لەو حاڵەتـانەدا باشترین خێر هی ئەو حاڵەتـانەیە.

**مەسەلەی حەوتەم:** کە دێتە سەر باسی ئەو شەش جۆرە کەسە، کە دەبێ ماڵیـان پێبـدرێو هاوکـاریی مـاددیی بکـرێن، بەمجۆرە حەکیمـانەیە ڕیزبەنـدیی کـراون :

١- ﴿ ذَوِي ٱلْقُرْبَىٰ ﴾، خزمان، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {(الصَّدَقَةُ عَلَى الْمِسْكِينِ صَدَقَةٌ وَالصَّدَقَةُ عَلَى ذِي الرَّحِمِ اثْنَتَانِ صَدَقَةٌ وَصِلَةٌ) (رَوَاهُ التِّرمِذيّ برقم: (٦٥٨)، وَقَالَ: حَدِيثٌ حَسَنٌ، وَالنَّسَائِيُّ برقم: (٢٥٨١)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (١٨٤٤)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٣٣٤٤)، وَالحَاكِمُ برقم: (١٤٧٦)، عَنْ سَلْمَانَ بْنِ عَامِرٍ عَنْ أَنَسٍ عَنْ أَبِي طَلْحَةَ رضي الله عنه، وَصَحَّحَهُ الألباني في (المشكاة) برقم: (١٩٣٩)) واتە: خێرکردن بە نەدارو خەڵکی ئاتـاج هەر خێرو چاکەیە، بەڵام بە خزمی نـەدار، دوو شتە: هەم خێرو چاکەیەو هەم صیلەی ڕەحمیشی جێبەجێکـردووەو پەیوەنـدی خزمایەتیشی گەیانـدوە، ئنجا بۆیەش خـوا ﷻ ﴿ ذَوِي ٱلْقُرْبَىٰ ﴾ی خستۆتە پێش هەمووانەوە، چونکە تا خزمی هەژارو نەدارو موحتاجو لێقەوماوت هەبێ، نابێ بچی بۆ خەڵکی دوورو بێگـانە، بەڵێ ئەویش هەر خێرە، بەڵام خزمەکەت زیاتر چاوەڕوانی لەتۆ هەیەو، وەك تۆ بەحاڵی دەزانی، ڕەنگە خەڵکی دیکە ئاوا بەحاڵی.

٢- ﴿ وَٱلْيَتَٰمَىٰ ﴾، لە دوای خزمان ئنجا هەتیو، هەتیو کێیە؟ هەتیو: منداڵێکە باڵغ نەبوو بێتو بابی نەمابێت، چونکە (ابن كثير) بە سەنەدی خۆی لە عەلی کوڕی ئەبوو طالیبەوە خوا لێی ڕازی بێ، ئەویش لە پێغەمبەرەوە ﷺ هێناویەتی، کە فەرموویەتی: {(لاَ يُتْمَ بَعْدَ حُلُمٍ) (رَوَاهُ البَيْهَقِي في (سنن الصغرى) برقم: (٢٠٤٩)}، واتە: دوای بـاڵغ بوون هەتیویی نـامێنێ، هەر

منداڵێ کوڕ یان کچ، دوای ئەوەی باڵغ بوو بە هەتیو لەقەڵەم نادرێ، دیارە منداڵی بێ بابیش لە هەموو کەس زیاتر پێویستی پێیە، بۆیە خوای کاربەجێ لە پلەی دووەمدا باسی وی کردوە.

٣- ﴿ وَٱلْمَسَٰكِينَ ﴾، کۆی (مسکین)ە، واتە: نەدار، وە (مساکین)، لەگەڵ (فقراءْ) جیاوازییان هەیە، (فقراءْ) کۆی (فقیر)ە، کە من لە کوردیدا بە (هەژار)ی لێکدەدەمەوەو (مسکین)یش بە (نەدار)، جا هەژار ئەوەیە هیچی نەبێتو، نەدار ئەوەیە شتێکی هەبێ، بەڵام بەشی نەکا، پێغەمبەر ﷺ جوان بۆمان پێناسە دەکات کە نەدار کێیە؟ لە دوای خزمی ئاتاجو لە دوای منداڵی هەتیوی بێ باب، ئەو نەدارە کێیە؟ کەوا باشە ماڵی خۆتی پێببەخشی؟ پێغەمبەر ﷺ دەربارەی (مسکین) فەرموویەتی: {(لَيْسَ الْمِسْكِينُ الَّذِي تَرُدُّهُ التَّمْرَةُ وَالتَّمْرَتَانِ، وَلاَ اللُّقْمَةُ وَلاَ اللُّقْمَتَانِ، وَلَكِنْ الْمِسْكِينُ الَّذِي لاَ يَجِدُ غِنىً يُغْنِيهِ، وَلاَ يُفْطَنُ بِهِ فَيُتَصَدَّقُ عَلَيْهِ) (رَوَاهُ مَالِك برقم: (١٧٥٩)، وَالبُخَارِيُّ برقم: (١٤٧٩)، وَمُسْلِم برقم: (٢٣٩٠)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (١٦٣١)، وَالنَّسَائِيُّ برقم: (٢٥٧٢)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٣٣٥٢) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه}، واتە: نەدار بریتی نیە لەو کەسەی کە دەنکە خورمایەك یان دوو دەنکە خورما قەناعەتی پێدێنێ، یان پاروویەكو دوو پاروو (چونکە لە تۆ کەمێكو لەویدیکە کەمێكو لەویدیکەو لەویدیکە دەکا زۆر بۆی)، بەڵکو نەدارێك وا باشە کە تۆ ماڵی خۆتی بدەیەو هاوکاریی بکەی، کە هێندەی نیە بێ نیازی بکات، وە واش خۆی پێشان نادا کە نەدارە یانی: ناالێتەوەو دەست پانکاتەوە، یارمەتی بدەنو خێری پێ بکەن، بەخشین بەو جۆرە کەسانە زۆر خێرە، دراوسێیەکت، یاخود کەسێك لە شارەکەتدا، لە گوندەکەتدا، لە دەوروبەرت، یاخود دووریشە بەس دەزانی کە ئاتاجە، بەڵام عیززەتی نەفسی هەیەو دەستی پاناکاتەوەو ناکڕووزێتەوە، هەرچەندە زۆریش هەژارو نەدارە، بەڵام ئەگەر لە برسان بمرێو لە تینووان بخنکێ

لەبەر عیززەتی نەفسیو جوامێریی دەستی لەبەر کەس پاناکاتەوە، هاوکاریی کردنو دەستگرتنی ئەو جۆرە کەسانە خێرە، ئەمما ئەوەی کە سواڵکەرەو دێو دەڕوا ئەوە یەکی ناکەوێ.

٤- ﴿ وَٱبْنَ ٱلسَّبِيلِ ﴾، وشەی: (سبیل) واتە: ڕێگا ﴿ وَٱبْنَ ٱلسَّبِيلِ ﴾، واتە: ئەو کەسانەی کە دەربەدەر دەبن، یاخود میوان، یان ڕێبواری پەککەوتوو کە لە وڵاتی خۆی دوور کەوتۆتەوە.

٥- ﴿ وَٱلسَّآئِلِينَ ﴾، واتە: داواکەران، سواڵکەران کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {(لِلسَّائِلِ حَقٌّ وَإِنْ جَاءَ عَلَى فَرَسٍ) (رَوَاهُ أَحْمَد برقم: (١٧٣٠)، وَالطَّبَرَانِي برقم: (٢٨٩٣)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (١٦٦٥)، وَأَبُو يعلى برقم: (٦٧٨٤)، عَنْ عَلي رضي الله عنه، وَضَعَّفَهُ الألباني في (السلسلة الضَعِيفَة) برقم: (١٣٧٨)}، واتە: سواڵکەر مافی هەیە ئەگەر بە سواری ئەسپیش بێ، واتە: دەستی بە ڕووەوە مەنێ، ئەگەر هاتەماڵت، نەك کە بە ڕێگادا دەڕۆی، یان دەچیتە مزگەوتێ، (١٠٠) سواڵکەر دانیشتوە بدەیە هەموویان ! بۆیەش خوا ﷻ سواڵکەری خستۆتە پلەی پێنجەمەوە لە ڕیزبەندییدا، چونکە تێیاندا هەیە ڕاست دەکاو زۆریشیان تێدایە درۆ دەکاو پێویستی پێ نیەو، وەك عادەتو خوو، یان بۆ دەوڵەمەند بوون سواڵێ دەکات، وە دەربارەی سواڵکردن لەم فەرمایشتەدا پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {(لاَ تَزَالُ الْمَسْأَلَةُ بِأَحَدِكُمْ حَتَّى يَلْقَى اللَّهَ وَلَيْسَ فِي وَجْهِهِ مُزْعَةُ لَحْمٍ) (رَوَاهُ أَحْمَد برقم: (٥٦١٦)، وَالبُخَارِيُّ برقم: (١٤٧٤)، وَمُسْلِم برقم: (٢٣٩٣)، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنه}، واتە: یەکێکتان هەر داوا دەکات لە خەڵکیو هەر داوا دەکات، (دیارە سواڵکردنیش هەر ئەوە نیە بچێ دەست پانبکاتەوە، بەڵکو هەندێ داواکردنیش هەیە هەر دەچێتە قاڵبی سواڵەوە، کە بە کینایە، یان بە شێوەیەك کابرا ئاگادار دەکاتەوە) داواکردن لەگەڵ یەکێکتان بەردەوام دەبێت، هەتا کاتێ کە دەگاتە خوای بەرز، یەك پارچە گۆشت بە دەم

وچاویەوە نەماوە. وەك لە كوردەواریی خۆماندا دەڵێ: ئابڕووی چووە، یان وا دیارە لە قیامەتێ ئەوانەی بە ناحەق سواڵێ دەكەن‌و پێویستیان پێی نیە، ئەوانە خوا بەوە سزایان دەدا، كە گۆشتیان بەدەم‌و چاوەوە نامێنێ.

٦- ﴿وَفِي ٱلرِّقَابِ﴾، واتە: لە ئازادكردنی كۆیلاندا، بۆیەش وایفەرمووە، نەیفەرمووە (العبید) یان ﴿ٱلرِّقَابِ﴾، وە فەرموویەتی: ﴿وَفِي ٱلرِّقَابِ﴾، چونكە تۆ پێویستە ماڵەكەت بە جۆرێك بەكاربێنی كە ئەوان ئازاد بكرێن، جا دیارە ئێستا (الحمد لله) كۆیلە نەماون بەو شێوەیەی كاتی خۆی هەبووە، بەڵام زۆر لە میللەتان هەر كۆیلەن، كۆیلەی زلهێزەكان‌و دەسەڵاتدارەكانن، كۆیلایەتی سیاسیی، مەرج نیە ئەو كۆیلایەتییەی كە كاتی خۆی هەبووە! بەڵكو كۆیلایەتییەكی ژێر پەردانەی هاوچەرخ.

**مەسەلەی هەشتەم:** كە نوێژو زەكات دواخراون‌و خراونەتە دوای ئیمان‌و عەقیدەوە، ئەوە دیارە هەر دەبێ وابێ، بەڵام كە خراوەتە دوای ماڵ بەخشین، ئەوە بۆ ئەوەیە مسوڵمانان بزانن كە ماڵ بەخشینی فەرز لەسەر مسوڵمانان تەنیا زەكات نیە، وەك لە فەرمایشتی پێغەمبەردا ﷺ هاتوە: {(عَنْ فَاطِمَةَ بِنْتِ قَيْسٍ قَالَتْ: سَأَلْتُ النَّبِيَّ ﷺ إِنَّ فِي الْمَالِ لَحَقًّا سِوَى الزَّكَاةِ؟ ثُمَّ تَلاَ هَذِهِ الآيَةَ: ﴿وَءَاتَى ٱلْمَالَ عَلَىٰ حُبِّهِۦ﴾) (رَوَاهُ وَالتِّرمِذِيُّ بِرقم: (٦٥٩)، وَابْنُ مَاجَهْ بِرقم: (١٧٨٩)، وَضَعَّفَهُ الأَلْبَانِي فِي (السلسلة الضعيفة) بِرقم: (٤٣٨٣)} واتە: (فَاطِمَة بنتِ قَيسٍ) دەڵێ: پرسیارم لە پێغەمبەر ﷺ كرد لە ماڵ‌و ساماندا هەقی دیكە جگە لە زەكات لە ماڵ‌و ساماندا هەیە؟ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ ئەو ئایەتەی بۆ خوێندەوە: ﴿وَءَاتَى ٱلْمَالَ عَلَىٰ حُبِّهِۦ﴾، كەواتە: جگە لە زەكاتیش حەقی دیكە لە ماڵ‌و ساماندا هەیە، كە یارمەتی توێژە كەمدەست‌و لێقەوماو‌و ئاتاجەكانی كۆمەڵگای پێ بدەن.

**مەسەلەی نۆیەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ وَٱلصَّٰبِرِينَ فِي ٱلۡبَأۡسَآءِ وَٱلضَّرَّآءِ وَحِينَ ٱلۡبَأۡسِ ﴾،

واتە: خۆڕاگران لە کاتی نەداریی‌و لە کاتی نەخۆشیی‌و لە کاتی جەنگدا، لێرەدا خوا ﷻ دەیەوێ فێرمان بکات، کە خۆڕاگریی هەر ئەوە نیە، کە لەبن باری زوڵمێدا خۆت ڕاگری، یان لەسەر نەداریی خۆت ڕاگری، بەڵێ کە نەدار بووی خۆت ڕابگرە، بەو مانایە، کە خۆت تووشی کاری ناشەرعیی‌و گوناهباریی نەکەی، وە کە نەخۆش بووی خۆڕاگربە، بەڵام لە کاتی جەنگ‌و لە بەرانبەر دوژمنانیشدا خۆڕاگربەو، ئەژنۆت نەلەرزێ‌و بەچۆکدا مەیە.

خوا بە لوتف‌و کەرەمی خۆی لەو کەسانەمان بگێڕێ کە بەو سیفەتە بەرزانە خۆیان دەڕازێننەوە، تاکو ئەم پێناسەی (بِرّ)مان بەسەردا بچەسپێ، کە لەم ئایەتەدا، ئایەتی (١٧٧) هاتوە.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی سی وشەشەم

## پێناسـەی ئەم دەرسـە

خوا پشتیوان بێ لەم دەرسەماندا هەر لە خزمەتی سوورەتی (البقرة)داین، لە ئایەتی: (١٧٨ تا ١٨٢)، واتە: پێنج (٥) ئایەت، لەم پێنج ئایەتەدا خوای پەروەردگار باسی تۆڵە دەكات، واتە: ئەگەر كەسێك كەسێكی بە ئەنقەستو بە زوڵم كوشت، دەبێ بكوژرێتەوە، وە باسی وەسیەتیش دەكات، كەسێك كاتی مردنی هاتو هەستی كرد كە نەخۆشیی مردنیەتی، یاخود بەرەو مەرگە، دەبێ وەسیەت بكات، جا ئایا وەسیەت حوكمی چییەو چۆنە؟ وە دەبێ چۆن وەسیەت بكرێ؟ وە لە چەندا وەسیەت بكرێ؟ كە ئەوە بە تەفصیلی باسی لێ دەكەین، لەمیانەی تەفسیری ئایەتەكاندا.

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ كُتِبَ عَلَيْكُمُ ٱلْقِصَاصُ فِى ٱلْقَتْلَى ۖ ٱلْحُرُّ بِٱلْحُرِّ وَٱلْعَبْدُ بِٱلْعَبْدِ وَٱلْأُنثَىٰ بِٱلْأُنثَىٰ ۚ فَمَنْ عُفِىَ لَهُۥ مِنْ أَخِيهِ شَىْءٌ فَٱتِّبَاعٌۢ بِٱلْمَعْرُوفِ وَأَدَآءٌ إِلَيْهِ بِإِحْسَـٰنٍ ۗ ذَٰلِكَ تَخْفِيفٌ مِّن رَّبِّكُمْ وَرَحْمَةٌ ۗ فَمَنِ ٱعْتَدَىٰ بَعْدَ ذَٰلِكَ فَلَهُۥ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿١٧٨﴾ وَلَكُمْ فِى ٱلْقِصَاصِ حَيَوٰةٌ يَـٰٓأُو۟لِى ٱلْأَلْبَـٰبِ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ﴿١٧٩﴾ كُتِبَ عَلَيْكُمْ إِذَا حَضَرَ أَحَدَكُمُ ٱلْمَوْتُ إِن تَرَكَ خَيْرًا ٱلْوَصِيَّةُ لِلْوَٰلِدَيْنِ وَٱلْأَقْرَبِينَ بِٱلْمَعْرُوفِ ۖ حَقًّا عَلَى ٱلْمُتَّقِينَ ﴿١٨٠﴾ فَمَنۢ بَدَّلَهُۥ بَعْدَمَا سَمِعَهُۥ فَإِنَّمَآ إِثْمُهُۥ عَلَى ٱلَّذِينَ يُبَدِّلُونَهُۥٓ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿١٨١﴾ فَمَنْ خَافَ مِن مُّوصٍ جَنَفًا أَوْ إِثْمًا فَأَصْلَحَ بَيْنَهُمْ فَلَآ إِثْمَ عَلَيْهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١٨٢﴾ ﴾.

## مانــای وشــە بە وشـــەی ئایەتەكــان

((ئــەی ئەوانــەی بڕواتــان هێنــاوە! تۆڵــەتان لــە كــوژراوان (ی بــە ئەنقەســتو ناهەق)دا لەسەر پێویست كراوە، ئازاد بە ئازادو كۆیلە بە كۆیلەو مێینە بە مێینــە، جــا هــەر كەســێك لەلایــەن برایەكەیــەوە شــتێكی لــێ بــوردرا، بــا بەدواداچــوونێكی چــاك (لەلایــەن خــاوەن هەقــەوە)و پێــدانێكی چــاك (لەلایــەن كوژەرەوە) ڕەچاو بكرێ، ئەوە لەسەر سووككردنو بەزەیی یە لە پەروەردگارتانەوە، وە هەركەسێ دوای ئەوە دەستدرێژیی بكات، ئەوە ئازارێكی بە ئێشی هەیە ﴿١٧٨﴾ وە بۆ ئێوە لە تۆڵــەدا ژیان هەیە ئەی خاوەن عەقڵان! بەڵكو خۆتــان بپــارێزن لە (خوێنــرِێــژیی) ﴿١٧٩﴾ هەركــات یەكێكــتان مــەرگی گەیــشتە ســەری، ئەگــەر مــاڵو سامانێكی بەجێدەهێــشت، وەسیەت كردنتــان لەسەر پێویست كراوە، بــۆ بــابو دایكو خزمان بە شێوەیەكی باش، ئەوە هەقێكە لەسەر پارێزكاران ﴿١٨٠﴾ جا هەر كەسێك ئــەو وەسیەتــەی پــاش گــوێ بیــست بــوون، گــۆڕی، ئــەوە گوناهەكەی لــە ئەســتۆی ئەوانەیــە كــە دەیگــۆڕن، بەڕاســتی خــوا بیــسەری زانایــە ﴿١٨١﴾ بــەڵام هەركەســێك مەترســی هەڵــە یــاخود گونــاهی لــە بابای وەسیەتكــەر هــەبوو، (لــە وەسیەتەكەیدا) وە چاكسازیی لە نێوانیاندا كــرد، ئەوە گوناهبار نــابێ، بێگــومان خوا لــێبوردەی بەخشندەیە﴿١٨٢﴾))

## شــیكردنــەوەی هەندێــك لە وشــەكان

(اَلۡقِصَاصُ )؛ بە كوردی دەڵێین: تۆڵــە، یانی: كەسێك كەسێك بكوژێت، بكوژرێتەوە،

واتە: تۆڵــەی لــێ بكرێتــەوە، (قِصَاص) لــە (قَصّ)ەوە هــاتوە (القَصُّ: تَتَبُّعُ الأَثَـرِ) وەدوای شوێنەوار كەوتن، وە دەگوترێ: (قَصَصتُ أثَرَهُ) واتــە: بــەدوای شــوێنەوارەكەی كــەوتم، وە هەواڵــە شــوێن هەڵگیــراوەكــان (قِصَص)ی پــێ دەگوترێ، (والقِصَاصُ: تَتَبُّعُ الدَّمِ بالقَـوَدِ)، (قِصَاص) بریتیــە لــەوەی كــە تــۆ

شوێن خوێن بکەوی بە تۆڵە، واتە: تۆڵەی خوێن بکەیەوە (وقَصَّ الثَّوْبَ قَطَعَهُ بالمِقَصِّ)، واتە: بەرگەکەی بە مەقەست بڕی.

(ٱلْقَتْلَى ): کۆی (قتِيل)ە واتە: کوژراو، وەك: (جَرحَى) کە کۆی (جَرِيح)ە واتە: بریندار، وە (أسرى) کە کۆی (أسيرَ)ە، واتە: دیل، لێرەدا (قتِيل) (مُذكّر)و (مُؤنَّث)ی تێدا یەکسانەو هەردووکیان دەگرێتەوە.

(فَٱتِّبَاعٌ ): دەگوترێ (تَبِعَهُ وَأتَّبَعَهُ: قَفَا أَثَرَهُ) بەدوای شوێنەواری کەوت (بالجسم أو بالإرتسام أو الإئتمار) شوێن کەوتن کە دەگوترێ (اتبّعهُ) چ بە جەستە بەدوای شتێك بکەوێ، چ بە دواکەوتنی مەعنەویی، کە بریتیە لە جێبەجێکردنی فەرمان.

(بِٱلْمَعْرُوفِ ): (الْمَعْروفُ: اسم لِكُلِّ فعل يُعرَفُ بالعَقْلِ أَو الشَّرْعِ حُسْنُهُ، والْمُنكَرُ: مَا يُنْكَرُ بِهِما) واتە: (مَعْروف) هەرشتێکە کە بە عەقڵ، یان بە شەرع بناسرێ، وە بزانرێ کە شتێکی باشە، (مُنْكَر)یش پێچەوانەی (مَعْرُوف)ە، هەرشتێك کە بە عەقڵ و شەرع بزانرێ خراپە، بە کوردییش (مَعْرُوف) دەبێتە (پەسند)و (مُنْكَر) دەبێتە (ناپەسند).

(وَأَدَآءٌ إِلَيۡهِ ): (دَفعُ مَايَحقُّ دَفعهُ وتوفيتهُ)، (أَدَاء) بریتیە لەوەی ئەو هەقەی دەکەوێتە لایەنی بکوژ، بدرێ، (كـأداء الخَرَاجِ والجزيَة وَأَدَاء الأَمَانَة، وَأَصْلُهُ: من تناولت الأداة)، واتە: وەك خەراج و سەرانەو جێبەجێکردنی سپاردە، وە ڕیشەکەی لەوەوە کە دەست بۆ ئامرازێك ببەیت.

(ٱلۡأَلۡبَٰبِ ): کۆی (لُبُّ)ە ، (اللُّبُّ: العَقْلُ الخَالِصُ مِنَ الشَّوَائِب)، واتە: عەقڵێکی بێ خڵتە لە ژەنگ و ژارو بێ خڵتە (خڵتەش هەرشتێکە کە ڕەگەڵ عەقڵ دەکەوێ، لە هەواو ئارەزوو گومان و بیروبۆچوونی غەڵەت) عەقڵیش بۆیە ناونراوە کاکڵ (لُب)، چونکە حەقیقەتی ئینسان لە عەقڵدا شێرراوەتەوە، هەروەك حەقیقەتی هەر میوەیەك لە کاکڵەیدا شێرراوەتەوەو

ئەگەر کاکڵی نەبێ، توێکڵەکەی بە کەڵکی چی دێ؟ ئینسانیش ئەگەر عەقڵی نەبێ، مانای وایە کەلەشێکە، وەك هەموو ئاژەڵانەی دیکە.

(خَيْرًا ): (الخَيْرُ: مَا يَرْغَبُ فِيهِ الكُلُّ) (خَيْر) هەرشتێکە کە زۆربەی خەڵکی ئارەزوومەندی بن، بەڵام (إِن تَرَكَ خَيْرًا ) لێرەدا (خَيْراً) بە مانای ماڵو سامان دێت چونکە ماڵو سامانیش خەڵك ڕەغبەتی لێیەو ئارەزووی دەکات، وە هەندێ گوتوویانە: ماڵو سامان پێی ناگوترێ: (خَيْراً) مەگەر حەڵاڵ بێو زۆربێ.

(اَلْوَصِيَّةُ ): (الوَصِيَّة: التَّقَدّمُ إلى الغَيْرِ بِمَا يَعْمَلُ بِهِ مُقتَرِناً بوَعْظٍ)، (وَصِيَّة) ئەوەیە کە تۆ شتێك لە ڕووی ئامۆژگارییکردنەوە بە کەسێك بڵێی بۆ ئەوەی کە جێبەجێی بکات، کەواتە: وەسیەت مەرج نیە هەر هی بابای کاتی گیانەڵاو کاتی پێش مەرگو گیان دەرچوون بێ، چونکە ئەوەتا خوای پەروەردگار دەفەرمووێ: ﴿ ... ذَٰلِكُمْ وَصَّىٰكُم بِهِۦ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ﴿١٥٣﴾ ﴾الأنعام، ﴿ ... ذَٰلِكُمْ وَصَّىٰكُم بِهِۦ لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ﴿١٥١﴾ ﴾، الأنعام ﴿ ... ذَٰلِكُمْ وَصَّىٰكُم بِهِۦ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ ﴿١٥٢﴾ ﴾الأنعام ، کە پێیان دەگوترێ (الوَصَايا العَشْرُ) کە خوا (١٠) دە شتی باسکردوونو لەدوای هەر ژمارەیەکیان دەفەرمووێ: ئەوە پەروەردگارتان وەسیەتتانی پێ دەکات، بەڵکو بفامن، بەڵکو بیرکەنەوە، بەڵکو پارێز بکەن.

(جَنَفًا ): (أَصْلُ الجَنَفِ: مَيْلٌ في الحُكم) لە دادوەرییدا مەیلکردنو لادان پێی دەگوترێ: (جَنَف) وەك لە قورئاندا هاتوە: ﴿ غَيْرَ مُتَجَانِفٍ لِّإِثْمٍ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٣﴾ ﴾المائدة، (أي مائلٍ إلَيهِ) مەیل بکا بەلای گوناحداو ئارەزووی گوناح بکات.

## هـۆی هاتنە خـوارەوەی ئایەتەکـان

هـۆی هاتنـە خـوارەوەی ئـەو ئایەتـەی کـە دەفـەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُتِبَ عَلَيۡكُمُ ٱلۡقِصَاصُ فِي ٱلۡقَتۡلَى ... ﴾، {(أَخْرَجَ إبْنُ أَبي حَاتم عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ قَالَ: أن حَيَّينِ مِنَ العَرَب اقتَتَلُوا في الجَاهِلِيَةَ قَبْلَ الإسلاَم بقَليل، فَكَانَ بَينَهُم قَتلٌ وَجِرَاحَات حَتَّى قَتَلوا العَبِيد والنِسَاءَ، فَلَمْ يَأخُذ بَعضُهُم مِنْ بَعْضٍ حَتَّى أسلَموا، فَكَانَ أَحَدُ الحيين يَتَطَاوَل عَلَى الآخر في العِدَّة والأموَال، فحَلَفوا ألاّ يرضوا حَتَّى يُقتَل بالعَبد مِنَّا الْحُرّ مِنْهُمْ، وَبالْمَرأَة مِنَّا رَجُلٌ مِنْهُمْ، فَنَزَلَتْ الآية) (فَتحُ القَدِير لِلشَوكاني، ج: (١)، ص: (٢٣٣)، وأسبَاب النزول للنيسابوري، ص: (٣٣)}

ئاگاداریی: {زۆر جار هۆی هاتنە خوارەوە (سبب النزول) یارمـەتیمان دەدات کـە بە شێوەیەکی ڕاستو دروست لە مانای ئایەتەکـان تێبگەین، کـە خـوا مەبەسـتی چی بووە، وە ئەگەر ئینسان لە هۆی هاتنەخوارەوەی ئایەتەکە تێنەگەیشت، دوایی ڕەنگە لە تێگەیشتنی ئایەتەکەی بەهەڵەدا بچێو ئەنجامگیریی هەڵەی لێبکات}.

واتە: دوو تیـرە لە عەرەبەکانی سەردەمیی نەفامیداو پێش ئیسلام بە ماوەیەکی کەم جەنگو شەڕیان لەنێوان دابوو، لـە یەکتـریان کوشت بـوو لـە وە یەکتـریان بریندار کردبوو هەتا کۆیلەو ئافرەتیشیان لە یەکتـر کوشتبوون، بەڵام بەتـەواویی هەقیـان لە یەکـدی وەرنـەگرتبۆوە (واتە: بە تەواویی دڵیان ئاوی نەخوارد بۆوە لـە یەکـدی)، هەتـا مـسوڵمان بـوون کـە مـسوڵمان بـوون، تیـرەیەکیان لەویدیکـەیان بەهێزتر بووو شانازیی بەسـەر ئەویدیدا دەکرد، لەبەرئـەوەی کە لـە ڕووی چـەكو لەڕوویماڵو سامانەوە بەهێزتر بوون، وە سوێندیان خوارد لەوانەی بـێهێزن، کـە ڕازی نابن هەتاکو لە بەرانبەر کۆیلەیەکیاندا کـە لێیـان کوژراوە، ئینـسانێکی ئـازاد نەکوژن، وە لە بەرانبەر ئافرەتێکدا کە لێیان کوژراوە، پیاوێك نەکـوژن لـە تـەرەفی بەرانبـەر، ئیـدی خـوا ﷻ ئـەم ئایـەتەی نـاردە خـواری: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُتِبَ عَلَيۡكُمُ ٱلۡقِصَاصُ فِي ٱلۡقَتۡلَى ٱلۡحُرُّ بِٱلۡحُرِّ وَٱلۡعَبۡدُ بِٱلۡعَبۡدِ وَٱلۡأُنثَىٰ بِٱلۡأُنثَىٰ ... ﴾.

## مانـــای گشـــتی ئایەتەکـــان

خـوا ﷻ جارێکی دیکـە ڕووو لـە ئەهـلی ئیمـان دەکـاتو بـۆ جاری چـوارەم بـە نازنـاوی ئیمان دەیان دوێنێو دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُتِبَ عَلَيۡكُمُ ٱلۡقِصَاصُ فِي ٱلۡقَتۡلَىۖ ﴾، ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە! تۆڵەتان لە کوژراواندا لەسەر پێویست کراوە، واتـە: لەسـەرتان پێویسـتە سـزای تۆڵـە جێبـەجێ بکـەن، لـە کاتێکـدا کـە خەڵك دەکوژرێ، پیاوبێ، ئافرەت بێ، کۆیلە بێ، ئازادبێ، گچکە بـێ، گەورەبـێ، ﴿ ٱلۡحُرُّ بِٱلۡحُرِّ وَٱلۡعَبۡدُ بِٱلۡعَبۡدِ ﴾، ئـازاد بـە ئـازاد (یەکـێکی ئـازاد کـوژرا بـێ، دەبـێ بکوژەکەی بکوژرێتەوە) وە کۆیلە بە کۆیلــە، (کۆیلەیـەك یەکێکـی کوشتوە ئـازاد بێ یـان کۆیلــە، دەبێت خۆی بکوژرێتەوە کە کۆیلەیـە) ﴿ وَٱلۡأُنثَىٰ بِٱلۡأُنثَىٰۚ ﴾، مێینـە بەمێینە، (مێینەیەك مێینەیەکی کوشتوە، دەبـێ خـۆی بکوژرێتـەوە) واتـە: ئـەوەی کـە لـەنێو عەرەبەکانـدا لـە سـەردەمی نەفامییـدا بـاوبووە، کـە ئەگـەر تیـرەیەك بـەهێزتر بووایــە، منداڵــیان لــێ کــوژرابا دەیانگــوت: پیـــاوی گــەورە نــەبێ نامانەوێتـەوە، وە جاری وا هەبووە یەکێکی سادەیان لێ دەکوژرا، دەیانگوت دەبـێ سەرۆك تیرەکەتانمان تەسلیم بکەن بیکوژینـەوە، ئەگەرنا ڕازی نـابین، یـان جاری وابووە یەکێکیان لـێ دەکـوژرا دەیـانگوت: دەبـێ دە (١٠) نەفـەرمان تەسـلیم بکـەن، یـان دوو نەفـەرمان تەسـلیم بکـەن بیانکوژینـەوە، خـوا ﷻ لێـرەدا ئـەو بنـچینە شەرعییە ڕادەگەیەنێ کە: نەفس بە نەفسـە، وە ئـەوە هـەر شـەرحو تەفصیلی ئـەو ئایەتە موبارەکەیە کە لە سـوورەتی (الـمائـدة)دا هـاتوە، کـە دەفـەرموێ: ﴿ وَكَتَبۡنَا عَلَيۡهِمۡ فِيهَآ أَنَّ ٱلنَّفۡسَ بِٱلنَّفۡسِ ... ﴿٤٥﴾ ﴾، لەسـەریان (واتـە: لەسـەر جوولەکـەکان) لە تەوراتدا نووسیومانە کە نەفس بە نەفس، یان دەفەرموێ: ﴿ ... مَن قَتَلَ نَفۡسَۢا بِغَيۡرِ نَفۡسٍ ... ﴿٣٢﴾ ﴾المائدة، کەواتـە: کەسـێك کـوژراوە لـە بەرانبەریـدا کەسـێك دەکوژرێتەوە، کە ئەویش بریتیە لە بکوژەکـە، نـەك کەسـێکی دیکـە. ﴿ فَمَنۡ عُفِيَ

لَهُۥ مِنۡ أَخِيهِ شَيۡءٞ فَٱتِّبَاعُۢ بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَأَدَآءٌ إِلَيۡهِ بِإِحۡسَٰنٖ ﴾، ئەگـەر یـەکێك شـتێکی لێبوردرا، چاوپۆشی لێکرا لە بەشێك لەو هەقـە لەلایـەن برایەکەیـەوە، لێرەدا خوای کاربەجێ کوژەرو کوژراوی بە برای یەك داناون، بۆ ئەوەی بەبیریان بێنێتەوە کە ئێوە هەرچەندە دەستتان چۆتە خوێنی یەکدی، بەڵام هەر برای ئیمانیی یەکن، بۆیە لەگەڵ یەکدا بە ڕەحم بن، ئەگەر کەسێك لەلایەن برایەکەیەوە چاوپۆشیی لێکرا، واتە: لەلایەن ئەو تەرەفەوە کە لێیان کوژراوە، بۆ وێنە: چاوپۆشییەکە ئەوەیە کە بڵێن: قەیناکات تۆڵە ناستێنینەوەو خوێنمان دەوێ ﴿ فَٱتِّبَاعُۢ بِٱلۡمَعۡرُوفِ ﴾، با خاوەن هەقەکە، واتە: تەرەفی کوژراو، بەشێوەیەکی چاكو باش بەدوای ئەو هەقـەی خۆیان بکـەون، کە بریتیە لە خوێن (دیة) ﴿ وَأَدَآءٌ إِلَيۡهِ بِإِحۡسَٰنٖ ﴾، تەرەفی بکوژیش بەشێوەیەکی باشو چاك، ئەو هەقو مافەیان تەسلیم بکەن، کە خوێنەکەیە ﴿ ذَٰلِكَ تَخۡفِيفٞ مِّن رَّبِّكُمۡ وَرَحۡمَةٞ ﴾، ئا ئەوە سووککردنێکە، وە بەزەیی نواندێکە لە پەروەردگاتانەوە، لە شەریعەتی جوولەکەکاندا تەنیا تۆڵە (قصاص) هەیەو خوێنو لێبوردن (عفو) نیە[1]، وە لە شەریعەتی نەصرانییەکاندا تەنیا لێبوردن (عفو) هەیەو تۆڵەستاندنەوە نیە[2]، بەڵام شەریعەتی ئیسلام هەرسێکی داناون، تۆڵەو خوێنو لێبوردن (عفو)، وەك دوایی ڕوونی دەکەینەوە، جا دەفەرموێ: ﴿ فَمَنِ ٱعۡتَدَىٰ بَعۡدَ ذَٰلِكَ فَلَهُۥ عَذَابٌ أَلِيمٞ ﴾، ئنجا هەر کەسێك دوای ئەوە دەستدرێژیی کرد، ئەوە ئازارێکی بەئێشی هەیە ﴿ بَعۡدَ ذَٰلِكَ ﴾، (دوای ئەوە) یانی چی؟ دەگونجێ مەبەست پێی تۆڵە (قصاص) بێ، واتە: کە کەسێك لە لایەك کوژراوە، مادام بکوژەکە کوژرایەوە،

---

١) بڕوانە (التفسير التطبيقي للكتاب المقدّس) العهد القديم، سفر الخروج، الإصحاح: (٢١)، ص (١٧٥)، کە دەڵێ: (مَنْ ضربَ إنساناً و قَتَلَهُ فالضارِبَ حَتماً يموت).

٢) بڕوانە سەرچاوەی پێشوو، العهد الجديد، إنجيل مَتَّى، الإصحاح: (٥)، ص (١٨٨٦)، کە دەڵێ: (وسمعتم أنه قيل: عَينٌ بِعَينٍ و سِنٌّ بسِنٍّ، أمّا أنا فأقولُ لكم لا تقاوموا الشرَّ بمثله، بل مَنْ لَطَمَكَ على خَدِّكَ الأيمن فَأَدِرْ لَهُ الخدَّ الآخر...).

نابێ چیدیکە دەستدرێژیی بکەن‌و بڵێن: دەبێ یەکێکیشیان بکوژین، وە دەگونجێ وشەی: ﴿ بَعْدَ ذَٰلِكَ ﴾، مەبەست پێی خوێن بێت، واتە: دوای ئەوەی کابرا خوێنی وەرگرتوە، نابێ بە بکوژ بڵێ: دەتکوژمەوە، وە دەگونجێ مەبەست پێی عەفوو بێ، مادام یەکێك لە تەرەفی کوژراوەکە کە خاوەنی صەلاحیاتە، بکوژەکەی عەفوو کرد، تازە بۆی نیە بڵێ: ئەمڕۆ لێی دەبوورم، بەڵام بەیانی ئەگەر دەسەڵاتم هەبوو دەیکوژمەوە! بۆیە دەفەرموێ: هەرکەسێك دەستیدرێژیی بکات دوای ئەوە، یانی: دوای تۆڵە، یان دوای خوێن، یان دوای عەفوو ﴿ فَلَهُۥ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴾، ئەوە ئازارێکی بەئێش‌و ژانی بۆ هەیە لە دواڕۆژدا، وە لە دنیاشدا دەکوژرێتەوە، ئەگەر کەسێك بکوژێ بە ناهەق، ﴿ وَلَكُمْ فِي ٱلْقِصَاصِ حَيَوٰةٌ يَٰٓأُو۟لِي ٱلْأَلْبَٰبِ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ﴾، وە بۆ ئێوە لە تۆڵەدا ژیان هەیە ئەی خاوەن عەقڵان، بەڵکو خۆتان بپارێزن، {لە خوێن ڕشتنی یەکدی، وە خۆتان بپارێزن لەوە کە خۆشتان خوێنتان بڕژێ}، (لە تۆڵەدا ژیان هەیە) بەڕاستی ئەم ڕستە قورئانییە لەگەڵ کورتییدا مانای زۆر زۆر گەورەی هەن، (السیوطي) لە کتێبی (الإتْقَان فِي علُوم القُرْآن)دا هێناویەتی کە ڕستەیەکی دیکە لەنێو عەرەباندا باو بووە، وەك پەندێك دەڵێ: (القَتْلُ أَنْفَى للقَتْلِ)، واتە: کوشتن دەبێتە هۆی نەهێشتنی کوشتن، (السیوطي) بەراوردی کردوە لەنێوان ئەم ڕستە قورئانییە ﴿ وَلَكُمْ فِي ٱلْقِصَاصِ حَيَوٰةٌ ﴾، لەگەڵ ئەوە کە عەرەبەکان بەکاریان هێناوە، لە بیست (٢٠) ڕووەوە ئایەتە قورئانییەکە ئیمتیازی هەیە بەسەر ئەو پەندەی عەرەبەکاندا کە لێرە مەجال نیە باسیان بکەین، بەڵام گرنگ ئەوەیە ئەو ڕستە قورئانییە وەك هەموو ڕستەکانە، بەڵام بە بەراورد لەگەڵ ئەوەی کە عەرەبەکان کردوویانە بە پەندو، زۆریشیان پێ پەندێکی عەجایب‌و پڕ واتا بووە، کەچی لە بیست (٢٠) ڕووەوە ئایەتەکە ئیمتیازی بەسەریدا هەیە، بەڵکو لەوە زیاتریش، بەڵام ڕەوانبێژان ئەم بیست (٢٠) ڕووەیان هێناون، ئنجا دوای ئەوە خوا ﷻ دێتە سەر باسی مەسەلەیەکی دیکە، کە وەسیەتەو دەفەرموێ: ﴿ كُتِبَ عَلَيْكُمْ إِذَا حَضَرَ أَحَدَكُمُ ٱلْمَوْتُ إِن تَرَكَ خَيْرًا ٱلْوَصِيَّةُ ﴾،

لەسەرتان پێویست كراوە یەكێكتان كە مردنی گەیشتە سەر، ئەگەر ماڵو سامانێكی بەجێ دەهێشت، دەبێ وەسیەت بكات ﴿لِلْوَٰلِدَيْنِ وَٱلْأَقْرَبِينَ﴾، بۆ بابو دایكو بۆ خزمان ﴿بِٱلْمَعْرُوفِ﴾ بەڵام وەسیەتەكە با بە شێوەیەكی باش بێ، كە وەك دوایی باسی دەكەین، وەسیەت لە سێیەكی ماڵدا دروستە، ئەمما هەموو ماڵی خۆی بكاتە وەسیەت، ئەوە دروست نیە، یان ئەگەر وەسیەتەكە بۆ بێگانانی بكاتو بۆ خزمانی نەكات، لای زۆربەی زانایان دروست نیە ﴿حَقًّا عَلَى ٱلْمُتَّقِينَ﴾، ئەوە وەسیەت كردنە بەو شێوەیە ئەوە مافێكە لەسەر پارێزكاران، ئەوەی بیەوێ لە ڕێزی پارێزكاراندا بنووسرێ، پێویستە وەسیەت بكات، بۆیە هەندێ لە زانایان دەڵێن: ئەمە ئەوە دەگەیەنێ كە وەسیەت كردن سوننەتەو فەرز نیە، چونكە خوا دەفەرموێ: ﴿حَقًّا عَلَى ٱلْمُتَّقِينَ﴾، مافێكە لەسەر پارێزكاران، ئەگەر لەسەر هەموو مسوڵمانان فەرز بووایە، دەیفەرموو: (حَقّاً عَلَى الْمُؤْمِنِين) بە هەرحاڵ ئەوەش بۆچوونێكە، پاشان دێتە سەر باسی ئەوە، كە ئەگەر وەسیەتەكە گۆڕا، دەفەرموێ: ﴿فَمَنۢ بَدَّلَهُۥ بَعْدَ مَا سَمِعَهُۥ فَإِنَّمَآ إِثْمُهُۥ عَلَى ٱلَّذِينَ يُبَدِّلُونَهُۥٓ﴾ هەركەسێك وەسیەتەكەی گۆڕی، دوای ئەوەی بیستوویەتی، ئەوە گوناحی لەسەر ئەوانەیە كە دەیگۆڕن، واتە: كابرا وەسیەتی كردوەو مردوە، بەڵام وەسیەتەكەیان گۆڕیوە، گوناحەكەی لەسەر خۆی نیە، چونكە كابرا وەسیەتەكەی بەشێوەیەكی چاكو شەرعیی كردوەو، بەڵكو گوناحەكەی لەسەر ئەوانەیە كە گۆڕیویانە، جا لەبەر ئەوەی ئەگەری ئەوە هەیە زیاد لە یەكێك بن، بۆیە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿فَإِنَّمَآ إِثْمُهُۥ عَلَى ٱلَّذِينَ يُبَدِّلُونَهُۥٓ﴾، وە بەزۆری وایە كە وەسیەت دەگۆڕرێ، چەند كەسێك تێیدا بەشدار دەبن ﴿إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾، بێگومان خوا بیسەری زانایە، بیسەرە دەزانێو ئاگای لێیە چ وەسیەت كراوەو چ گوتراوە، وە زاناشە دەزانێ ئەگەر پیلانێك بكرێ بۆ ئەوەی وەسیەتەكە بگۆڕرێ، ئەوە لە كاتێكدا كە وەسیەت بگۆڕرێ بەلای باری خراپدا، كابرا وەسیەتێكی باشو شەرعیی كردوە، دێن لێی دەگۆڕن ! ئەدی

ئەگەر کابرا لە ئەسڵی وەسیەت کردنەکەیدا لاریی هەبێت، یان بەهەڵەدا بچێ، یاخود خۆی تووشی گوناح بکات، ئەوە چۆنە ؟ ﴿ فَمَنْ خَافَ مِن مُّوصٍ جَنَفًا أَوْ إِثْمًا فَأَصْلَحَ بَيْنَهُمْ فَلَآ إِثْمَ عَلَيْهِ ﴾، هەرکەسێك مەترسیی هەبوو لە وەسیەتکەرێك، کە لابدا بە شێوەی هەڵە، یاخود بە ئانقەست بە شێوەیەك کە گوناهباربێ، چونکە جاری وا هەیە کابرا نازانێ گوناحە لادەدا بە نەزانیی، ئەوە پێی دەگوترێ: ﴿ جَنَفًا ﴾، وە جاری وا هەیە دەزانێ گوناحەو غەڵەتە، بەڵام بەهەر حاڵ وەسیەتەکەی بە لاریی دەکات، ئەوەش پێی دەگوترێ: ﴿ إِثْمًا ﴾، جا کەسێك مەترسیی هەبوو لە وەسیەتکەرێك کە بە یەکێك لەو دوو شێوانە وەسیەتێکی غەڵەت بکا ﴿ فَأَصْلَحَ بَيْنَهُمْ ﴾، بەڵام سوڵحی کرد لە نێوان ئەوانەدا کە وەسیەتیان بۆ دەکرێ، یاخود لەنێوان: وەسیەتکەرو وەسیەت بۆکراودا، ﴿ فَلَآ إِثْمَ عَلَيْهِ ﴾، ئەوە ئەو کاتە گوناهی ناگاتێ، واتە: کەسێك وەسیەتێکی ناشەرعیی و لار ڕاست بکاتەوەو بیخاتەوە سەر سکەی شەرع، ئەوە گوناهی ناگات، بۆ وێنە: لە سێیەکی ماڵەکەی زیاتری وەسیەت کردوە، ئەوە دەبێ ڕێی لێبگیرێ و بڵێ: دەبێ تەنیا لە سێیەکیدا وەسیەت بکرێ، دیارە ئەو کەسە کە ڕستەی: ﴿ فَمَنْ خَافَ ﴾، دەلالەتی لەسەر دەکات، مەبەست پێی: کۆمەڵگا یان دەوڵەتەو مەرج نیە نەفەرێك بێ، بەڵکو مەبەست ئەو خەڵکە مسوڵمانەیە کە دەزانن ئەو وەسیەتە بەشێوەیەکی غەڵەت کراوەو، دەبێ ڕاستی بکەنەوە، وە ئەگەر ڕاستیان کردەوە ﴿ فَلَآ إِثْمَ عَلَيْهِ ﴾، ئەوە گوناحیان ناگاتێ ﴿ إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴾، بێگومان خوا لێبوردەی بەخشندەیە، بۆیە خوای بەرز پێشێ دەفەرموێ: نابێ بگۆڕرێ، بەڵام دوایی ڕوونی کردۆتەوە کە ئەگەر شەرعیی بوو، نابێ بگۆڕرێ بە بارێکی ناشەرعییدا، بەڵام ئەگەر لە ئەسڵدا لارێ و ناشەرعیی بوو، دەبێ ڕاست بکرێتەوەو ئەو گۆڕینە گوناحی لەسەر نیە، بەڵکو پاداشتی لەسەر وەردەگیرێ.

## چەند مەسەلەیەكی گرنگ

**مەسەلەی یەكەم:** خوا ﷻ كۆمەڵگای ئیماندار دەدوێنێ‌و دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُتِبَ عَلَيۡكُمُ ٱلۡقِصَاصُ فِي ٱلۡقَتۡلَى ﴾، ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە ! تۆڵەتان لە كوژراواندا لەسەر پێویست كراوە، ئەمە ئەوەی لێوەردەگیرێ كە تۆڵەستاندنەوە لە بكوژ، ئیشی كۆمەڵگای مسوڵمانەو ئەركی دەسەڵاتی شەرعییە، نەك هەركەسێك ڕاست بۆوە بڵێ: من تۆڵە دەستێنمەوە ! (القُرطُبي)، دەڵێ[1]: {(لاَ خِلافَ أَنَّ القِصَاصَ فِي القَتْلِ لا يُقيمُهُ إلاّ أُولُو الأَمْرِ، فرضٌ عَلَيهم النهوضُ بالقِصَاص وَإقَامَةُ الْحُدود وَغيْرِ ذَلِكَ، لأَنَّ اللّهَ سُبحَانه خَاطَب جَميعَ المؤمِنينَ بالقِصَاص، ثُمَّ لا يَتهَيأ لِلمؤمِنينَ جَميعَاً أَنْ يَجْتَمِعُوا عَلَى القِصَاص، فَأقامُوا السُلطَان مَقام أَنْفُسِهِم في إقَامَةِ القِصَاصِ وغَيْرِهِ مِنَ الْحُدود)}، ئەم مەسەلەیە زۆر گرنگە بۆ ئەوەی كە مسوڵمانان بەهەڵەدا نەچن، وە ئەوە كە قورتوبیی هێناویەتی، هەموو توێژەرەوانی قورئان‌و شەرع زانانیش لە كتێب‌و سەرچاوەكاندا باسیان كردوە، كە هەڵسان بە جێبەجێكردنی سزاو سنوورە شەرعییەكان، ئیشی دەوڵەت‌و دەستەڵاتی شەرعییە.

(القُرطُبي) دەڵێ: ڕاجیایی نیە لەنێوان زانایاندا لەسەر ئەوە كە تۆڵە وەرگرتنەوە لە كوشتندا، هەروەها جێبەجێكردنی سنوورو سزا شەرعییەكانی دیكە، كاربەدەستان پێی هەڵدەستن‌و ئەوان لەسەریان پێویستە هەم تۆڵە وەربگرنەوەو هەم سزا شەرعییەكانیش جێبەجێ بكەن، چونكە خوای پاك‌و بێگەرد ئیماندارانی هەموو دواندوەو قسەی لەگەڵ هەمووواندا كردوە، كە تۆڵە بستێننەوە لە بكوژ، بەلام ئەوە ناگونجێ هەموویان پێی هەڵسن‌و ناگونجێ هەموویان كۆببنەوە لەسەر تۆڵە وەرگرتنەوە، بۆیە لەجیاتی خۆیان

---

١) الجامع لأحكام القرآن، ج: (٢)، ص: (٢١٨)، طبعة: المكتبة التوفيقية.

دەسەڵاتداریان داناوە، تاکو تۆڵە وەربگرێتەوە، وە بۆ ئەوەی غەیری تۆڵەش لە سزاو سنوورە شەرعییەکان جێبەجێ بکات. وەك گوتم: بەڕاستی ئەوە مەسەلەیەکی زۆر گرنگەو پێویستە بزانین لە هەموو ئەو شوێنانەدا کە خوا دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ﴾، ڕوو لە کۆمەڵگای مسوڵمانان و دەوڵەتی ئیسلامیی دەکا، واتە: مسوڵمانان لە حاڵێکدا کە کیان و قەوارەیان هەیە، چونکە مسوڵمانان تا دەوڵەت و قەوارەو کیانیان نەبێ، ناتوانن سزاو سنوورە شەرعییەکان و یاسا شەرعییەکان بەگشتی جێبەجێ بکەن.

**مەسەلەی دووەم:** حیکمەتی تۆڵە (قِصَاص) چییە؟ ئێستا زۆر لە عەلمانییەکان لەوانەی کە لافی بەرگرییکردن لە مافی ئینسان لێ دەدەن، پێیان وایە کە ئەو تۆڵەیەی ئیسلام دایناوە، کە ئەگەر کەسێك کەسێکی کوشت، بکوژرێتەوە، دەڵێن ئەوە دڵڕەقییەکی زۆری تێدایەو دەڵێن: جا باشە ئەوە کەسێکمان لەدەست چوو بۆ بیکەینە دوو، ئەوە دووانمان لەدەست چوو، بۆ بیکەینە چوار؟! بەڵام لەڕاستیدا ئەوە هەمووی سەفسەتەیە! وە بۆ زانیارییتان لە شەریعەتی ئیسلامییدا نەك یەك، بەڵکو ئەگەر دە کەسیش کەسێك بکوژن، هەر دە کەس دەکوژرێنەوە بۆچی؟ خوا ﷻ جوانی ڕوون کردۆتەوە، دەفەرموێ: ﴿ وَلَكُمْ فِى ٱلْقِصَاصِ حَيَوٰةٌ يَـٰٓأُو۟لِى ٱلْأَلْبَـٰبِ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ﴾، لە تۆڵەدا ژیان هەیە بۆ ئێوە، ئەگەر کابرای بکوژ بزانێ دەکوژرێتەوە، هەم گیانی کوژراوەکە سەلامەت دەبێ کە دوایی دەکوژرێ، هەم هی خۆشیی، ئنجا لەڕاستیدا ئەگەر ئەم سزا شەرعییە جێبەجێ بکرێ، وە هەموو سزا شەرعییەکانی دیکەش، خەڵك باش دەسڵەمێتەوە لە گوناح و تاوان، وە لە دەست درێژکردن بۆ سەر خوێن و ماڵ و سامان و نامووسی خەڵکی، کەواتە: لەڕاستیدا ئەوە قسەیەکی بێجێیەو سزا دەبێ توندبێ، بۆ ئەوەی خەڵك لێی بترسێ و لێی بسڵەمێتەوە، ئنجا دەڵێین: ئەو کەسەی کە بەناوی مافی مرۆڤەوە دیفاع لە بکوژ دەکات، ئەدی بۆچی دیفاع لە کوژراو ناکات، ئەدی ئەو چی لێدەکات ؟! ئەگەر بگوترێ: بە زیندانی کردن سزا دەدرێ، دەڵێین:

ئەوە لە ڕۆژئـاواو لـەو وڵاتانـەی کـە سـزای کوشـتنەویان نەهێشـتوە، تەجرەبـە کراوە کە لـە ڕاسـتیدا زۆر لـە تاوانبـارە گـەورەکان، لـە زینـدانو حەپـسخانەدا زیـاتر فێری تـاوان دەبـن !

**مەسەلەی سێیەم:** پێویسـته بزانـرێ سـێ جـۆرە کوشـتن هـەنو، تۆڵـە تەنهـا ڕوو لـە یەکێکیان دەکـات، کە بریتیـن:

یەکـەم: کوشـتنی بە ئانقەسـت (عَمْـد).

دووەم : کوشـتنی بە هەڵـە (خَطَـأ).

سـێیەم: کوشـتنی بـە ئەنقەسـت چـوو (شِبْهَ عَمْـد)، ئنجـا بـا پێناسـەی ئـەم سێیانە بکـەین[1]:

**یەکەم:** (القَتْلُ العَمْـد): کە (العَمْـد الـمحض)یشـی پێـدەگوترێ، ئـاوا پێناسـە کـراوە: (وَهُوَ أَن يَقصِد مَن يَعلَمُهُ مَعصوماً بِمَا يَقتـلُ غالِبـاً)، ئەوەیـە کـە بابـای بکوژ بەشتێك کـە بـە زۆری ئینسـانی پـێ دەکوژرێ، نەفەرێـك بکاتـە ئامانـج کە نابـێ بکوژرێو خوێنی پارێزراوە، کـەواتە:

١) ئامرازی کوشـتنەکە شـتێکە بەزۆریی وایە ئینسانی پێ بکـوژرێ.

٢) وە کـوژراو کەسێکە کـە کوشـتنی لەسـەر نیە.

٣) وە بکـوژ مەبەسـتیەتی بیکـوژێ.

واتـە: بکـوژ هـەم ئـامرازی کـوژەر بەکـاردێنێو، هـەم نیەتـی کوشـتنیشـی هـەیەو، هـەم ئەو کەسـەش کە دەیکوژێ هیچ هـەقی لەسـەری نیـەو شایسـتەی کـوژران نیـە، ئەوە کوشتنی ئانقەسـتە.

**دووەم:** (القَتْلُ شِبْهُ العَمْـد): کە (الخَطَأ العَمْد)یشی پێ دەگوترێ ئەمیش ئـاوا پێناسـە کـراوە: (وَهُوَ أَن يَضرِب شَخْصاً بِمَا لاَ يَقتـلُ غـالِبـاً)، ئەوەیـە کـە

---

[1] ئـەم پێناسـانە سـەرجەم زانایـان لەسـەریان پێکهـاتوون، بـەڵام مـن لـە: (محاسـن التأويـل)ی القاسـمي، وەرم گرتـوون، ج: (٢)، ص: (٤٢٨)، کـە ئـەویش لـە: (السياسـة الشرعية)ی ابـن تيميـة، وەری گرتوون.

بە شتێك لە کەسێك بدرێو بیکوژێ کە بە زۆریی بەو شتە خەڵك نامرێو ناکوژرێ، بۆ وێنە: گۆچانی لێدا، زللەیەکی لێدا، کە عادەت نیە خەڵك بە یەك گۆچان، یان بە یەك زللە، یان بە کەستەکە گلێك، مرۆڤ بکوژرێ، ئەوە کوشتنی وەك ئانقەست چوویە.

**سێیەم**: (القَتْلُ الخَطَأ): کە (الخطأ المحض)یشی پێ دەگوترێ ئەمیش ئاوا پێناسە کراوە: (مثل أَنْ يَرمِي صَيْداً أَو هَدَفاً فَيُصِيبُ إِنْسَاناً بِغَيرِ عِلْمِهِ وَلاَ قَصْدِهِ)، وەك ئەوەی تیرێك یان فیشەکێك یان بەردێك لە نێچیرێك یاخود لە ئامانجێك بگرێ، بەڵام بە ئینسانێك بکەوێ، بێ ئەوەی کە مەبەستی بووبێتو بێئەوەی کە پێشی زانیبی، ئەوە پێی دەگوترێ: کوشتنی هەڵە، وەك پێغەمبەر ﷺ لە فەرمایشتێکدا پێناسەی دەکاتو دەفەرموێ: {(أَلاَ إِنَّ قَتِيلَ الْعَمْدِ الْخَطَإِ بِالسوطِ وَالْعَصَا شِبْهِ الْعَمْدِ، فِيهِ مِائَةٌ مِنْ الإِبِلِ مُغَلَّظَةٌ مِنْهَا أَرْبَعُونَ خَلِفَةً فِي بُطُونِهَا أَوْلاَدُهَا) (رَوَاهُ النَّسَائِي بِرقم: (٤٧٩٤)، قَالَ الشيخ الأَلباني: صَحيح لِغَيرِهِ، في (سنن النسائي)}، واتە: ئاگاداربن کوشتنی عەمدی هەڵە یاخود بە ئانقەست چوو، ئەوەیە کە بە قامچی بێ یاخود بە گۆچان بێ، کە خوێنەکەی بریتیە لە سەد (١٠٠) حوشتر کە چلیان (٤٠) ئاوس بن، بەچکەیان لە زگدا بێتو، (٦٠) شەستەکەی دیکەیان تەمەنەکانیان جیاجیا، دیارە کوشتنی هەڵەش تەنیا خوێنو کەفارەتی هەیە، وەك لە سوورەتی (النساء)دا خوا باسی کردوە:

﴿ وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ أَن يَقْتُلَ مُؤْمِنًا إِلَّا خَطَـًٔا ۚ وَمَن قَتَلَ مُؤْمِنًا خَطَـًٔا فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُّؤْمِنَةٍ وَدِيَةٌ مُّسَلَّمَةٌ إِلَىٰٓ أَهْلِهِۦٓ إِلَّآ أَن يَصَّدَّقُوا۟ ۚ فَإِن كَانَ مِن قَوْمٍ عَدُوٍّ لَّكُمْ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُّؤْمِنَةٍ ۖ وَإِن كَانَ مِن قَوْمٍۭ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُم مِّيثَـٰقٌ فَدِيَةٌ مُّسَلَّمَةٌ إِلَىٰٓ أَهْلِهِۦ وَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُّؤْمِنَةٍ ۖ فَمَن لَّمْ يَجِدْ فَصِيَامُ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ تَوْبَةً مِّنَ ٱللَّهِ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمًا ﴿٩٢﴾ ﴾، واتە: بڕوادار بۆی نیە بڕوادار بکوژێ مەگەر بە هەڵە، وە هەرکەسێك

بڕواداریکی بە هەڵە کوشت ئەوە کۆیلەیەکی ئیماندار ئازاد دەکات (ئەوە وەك کەفارەت) وە خوێنیش دەدا تەسلیمی خاوەنەکەی دەکا (واتە: خاوەنی کوژراوەکە)، مەگەر خاوەن خوێنەکە خێرو چاکە بکەن (واتە: لە هەمووی یان هەندێکی ببیەخشن) جا ئەگەر کوژراوەکە لە کۆمەڵێکی دوژمن بە ئێوە بوو، وە بڕواداریش بوو، پێویستە بکوژ کۆیلەیەکی بڕوادار ئازاد بکات، وە ئەگەر کوژراوەکە لە کۆمەڵێك بوو کە پەیمانیان لەگەڵتان هەبوو، پێویستە خوێن (دیة)ێك تەسلیمی کەسەکانی بکرێ‌و کۆیلەیەکی بڕوادار ئازاد بکرێ، کەسێکیش (کۆیلەی) چنگ نەکەوت با دوو مانگ لەسەر یەك بە ڕۆژووبێ، وەك گەڕانەوەیەك بۆ لای خوا، وە خوا زانای کاربەجێیە، دیارە پێغەمبەریش ﷺ ڕوونی کردۆتەوە کە خوێن (دیة)ی کوشتنی بە هەڵەش، هەر سەد (١٠٠) حوشترە، بەڵام حوشترەکان لە جۆردا جیاوازن.

**مەسەلەی چوارەم:** پێویستە بزانرێ کە کوشتنی بە ئەنقەست، سێ حوکمی هەن، من زۆر جار کێشەی خوێن‌و صوڵحم هاتۆتە لا، زۆر کەس وادەزانێ کوشتنی بە ئەنقەست تەنیا یەك حوکمی هەیە، ئەویش ئەوەیە کە بابای بکوژ بکوژرێتەوە، بەڵام لەڕاستیدا وانیەو سێ جۆرە حوکمی هەن‌و تەرەفی نەفەر لێکوژراو، سەرپشك دەکرێ لە نێوانیاندا:

**یەکەم:** کوشتنەوەی بکوژ، **دووەم:** خوێن (دیة) وەرگرتن، **سێیەم:** عەفوو کردن، وەك لەو فەرموودەیەی پێغەمبەردا ﷺ دەبینرێ، کە فەرموویەتی: {(مَنْ أُصِيبَ بِدَمٍ أَوْ خَبْلٍ (وَالخَبلُ: الجُرُحُ) فهُوَ بالْخِيَارِ بَيْنَ إِحْدَى ثَلاثٍ، فَإِنْ أَرَادَ الرَابِعَةَ، فَخُذُوا عَلَى يَدِيهِ: أَنْ يَقْتُلَ أَوْ يَعْفُوَ أَوْ يَأْخُذَ الدِّيَةَ، فَمَنْ فَعَلَ شَيْئاً مِنْ ذَلِكَ فَعَادَ، فَإِنَّ لَهُ نَارَ جَهَنَّمَ خَالِداً مُخَلَّداً فِيهَا أَبَداً) (رَوَاهُ أَحْمَدُ برقم: (١٦٣٢٧)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٢٦٢٣)، عَنْ أَبِي شُرَيْحٍ الْخُزَاعِيِّ رضي الله عنه، وَضَعَّفَهُ الألباني في (إرواء الغليل)}، واتە: هەرکەسێك خوێنێکی تووش بوو (واتە: نەفەری لێکوژرا، یان بریندارییەکی لێ پەیدابوو) سەرپشکە لە نێوانی سێ شتاندا ئەگەر چوارەمی ویست (واتە: خوێنیش وەربگرێ‌و بشکوژێ

ئەوە چـوارەمە) مەهێڵن، سێ شتەکـانیش ئەمانــەن:

١) (أَنْ يَقْتُلَ) کابرای بکـوژ بکوژێتەوە، (جا پیاوە، ئافرەتـە، هەرکەس هەیە).

٢) (أَوْ يَعْفُوَ) یاخـود عەفووی بکـاتو نەیکوژێتەوەو خوێنیشـی نەوێت.

٣) (أَوْ يَأْخُذَ الدِّيَةَ) یاخـود خوێن وەربگرێ، جا دەفـەرموێ: هەرکەسێ یەکـێ لەو سێیانەی کـرد، بەڵام دوایی هاتەوە{و یەکێ لـەو سـێیانەشـی کـردەوە}، ئەوە سزای ئاگـری دۆزەخـەو بـە هەمیشـەیی تێیـدا دەمێنێتـەوەو هەرگـیز لـێی دەربـاز نـابێ، (واتـە: ئەگـەر لایـەنی لێکوژراو بابای بکـوژیان عـەفوو کـردو دوایـی کوشـتیانەوە، یـان لـە تۆڵـە دابـەزین بـۆ خـوێنو، دوایـی بابـای بکـوژیان کوشـتەوە...)، ئـەوە بەر ئەو هەڕەشـەیە دەکـەوێ .

__مەسەلەی پێنجەم:__ ئـەم ئایەتـە کـە دەفـەرموێ: ﴿ ٱلْحُرُّ بِٱلْحُرِّ وَٱلْعَبْدُ بِٱلْعَبْدِ وَٱلْأُنثَىٰ بِٱلْأُنثَىٰ ﴾، بـەپێی ڕواڵەتەکـەی کـە تەماشـای دەکـەی، واتـە: پیـاوێکی ئـازاد یـان ئـافرەتێکی ئـازاد، ئەگـەر یـەکی ئازادیـان کوشـت، پێـی دەکوژرێنـەوە، وە کۆیلـە ئەگەر کۆیلەیـەکی کوشـت، پێـی دەکوژرێتـەوە، وە ئـافرەت ئـافرەتی کوشـت پێـی دەکوژرێتەوە، بەڵام ئەگەر ئـافرەت پیـاو بکـوژێ، یـان پیـاو ئـافرەت بکـوژێ، یـان ئازاد کۆیلە بکوژێ، ئـەوە ناکـوژرێنەوە ! جـا هەرچـەندە ڕواڵـەتی ئایەتەکـە وای لـێ دەفامرێتەوە، بەڵام ئەم فامرانـەوە ڕواڵەتییـە مەبەسـت نیـە، وەك لـە هـۆی هاتنـە خوارەوەکەیدا باسمان کرد، کە هـۆی هاتنـە خوارەوەکەشـی ئـەوە بـوو، کـە لەنێو عەرەبەکاندا عادەتێك هـەبوو دووتیـرە کـە بەشـەڕ دەهـاتن، ئـەوەیان کـە بەهێزتر بووایە، ڕازی نـەدەبوو تـەنیا بکوژەکـە بکوژێتـەوە، بەڵـکو گوتوویـەتی دووم کەسـم دەوێـن، یـان سـەرۆك عەشـیرەتەکەتانم دەوێ، یـان جـاری وایـە ئافرەتیـان لێکـوژراوە، ویـستوویانە پیـاوێکی لـە بەرانبـەردا بکـوژن، یـان کۆیلەیەکیان لێکوژراوە گوتوویانە: ئازادێك لە بەرانبەریـدا دەکـوژین، جـا خـوا ﷻ لێرەدا مەبەسـتی پێ ئەوەیە کە ئەگەر ئازادتـان لێکـوژرا، هەر بۆتـان هەیـە ئـازاد بکوژنەوە، ئەگەر بکوژەکـە ئـازاد بـوو، وە ئەگـەر ئافرەتتـان لـێ کـوژرا،

هەر بۆتان هەیە ئافرەت بکوژنەوە، ئەگەر بکوژەکە ئافرەت بوو، کۆیلەش بەهەمان شێوە، هەروەها تۆڵە دەبێ یەك بەیەك بێ، نەك زیاتر.

(القاسمي) لە تەفسیرەکەی خۆی (مَحَاسِنُ التَأويل)[1]دا، دوای ئەوەی ئەو مەسەلەیەی کە ئێستا من ڕوونم کردەوە ڕوونی کردۆتەوە، دەڵێ: ((وَبِالجُمْلَةَ فَقَوْلِ اللهِ تَعَالَى: ﴿ ٱلۡحُرُّ بِٱلۡحُرِّ وَٱلۡعَبۡدُ بِٱلۡعَبۡدِ وَٱلۡأُنثَىٰ بِٱلۡأُنثَىٰۚ ﴾، لايُفِيدُ الحَصْرَ البتة، بَلْ يُفِيدُ شرع القِصَاص بَيْنَ الْمَذكُورِين مِنْ غَيْرِ أَنْ يَكُونَ فِيهِ دَلالَة عَلَى سَائِرِ الأَقسَام))، واتە: بە کورتی قسەی خوای بەرز کە دەفەرموێ: ئازاد بە ئازادو، کۆیلە بە کۆیلەو، مێینە بە مێینە، مەبەستی ئەوەنیە کە ئازاد تەنیا بە ئازاد دەکوژرێتەوەو، کۆیلە تەنیا بە کۆیلەو، ئافرەت تەنیا بە ئافرەت، بەڵکو مەبەستی ئەوەیە، کە ئەگەر ئەوانە یەکتریان کوشت دەکوژرێنەوە، بەڵام مەبەستی پێ ئەوەنیە، کە ئایا ئافرەت بە پیاو دەکوژرێتەوەو، پیاو بە ئافرەت دەکوژرێتەوە، یان نا ؟ ئەوە مەبەست نیە، بەڵکو باسی تۆڵە لە شوێنی دیکەدا هاتوە، بۆ وێنە: ﴿ وَكَتَبۡنَا عَلَيۡهِمۡ فِيهَآ أَنَّ ٱلنَّفۡسَ بِٱلنَّفۡسِ ... ﴿٤٥﴾ ﴾ المائدة، واتە: وە (لە تەوراتدا) لەسەریانمان نووسی کە: نەفسێك نەفسێکی کوشت دەکوژرێتەوە.

**مەسەلەی شەشەم:** تۆڵە فەرز نیە کە کابرای بکوژ حەتمەن بکوژرێتەوە، بەڵام هەقە، واتە هەقی تەرەفی لێکوژراوەو هەقیەتی ئەگەر بیەوێ، بەڵام فەرزنیە کە ئەگەر بکوژ نەکوژرێتەوە لایەنی لێکوژراو گوناهباربێ، چونکە جاری وا هەیە لە (صلح)دا شتی وام هاتۆتە پێش، تەرەفی خەڵك لێکوژراو گوتوویانە: مامۆستا جا چۆن تۆ داوامان لێدەکەی (صلح) بکەین‌و داوامان لێدەکەی خوێن وەربگرین، یان چۆن داوامان لێدەکەی عەفووی بکەین؟! گوتوومە بۆچی؟ گوتوویانە: ئەدی ئەوە نیە خوا دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ

---

١) (محاسن التأويل)، ج: (٢)، ص: (٤٣١).

ءَامَنُواْ كُتِبَ عَلَيْكُمُ الْقِصَاصُ فِي الْقَتْلَى ﴾، مانای وایە، ئەگەر وانەکەین گوناهبار دەبین‌و هەر دەبێ بیکوژینەوە ! بەڵام وەك باسمان کرد پێغەمبەر ﷺ ڕوونی کردۆتەوە، کە ئەرکی پێغەمبەر ﷺ ڕوون کردنەوەی قورئانە ﴿ ... وَأَنزَلْنَا إِلَيْكَ الذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ وَلَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٤٤﴾ ﴾ النحل ، واتە: قورئانمان بۆ تۆ ناردۆتە خوار، تاکو ئەوەی بۆ خەڵکی نێرراوەتە خوار بۆیان ڕوون بکەیەوە، پێغەمبەر ﷺ ڕوونی کردۆتەوە کە هەر کەسێك نەفەری لێکوژرا، یاخود بریندار کرا، بۆی هەیە یەکێ لە سێ شتان بکات، کە بریتین لە: کوشتنەوە یاخود بریندارکردنەوە، وە خوێن وەرگرتن، وە عەفووکردن، وە لێرەدا (القُرطُبي) لە تەفسیرەکەی خۆیدا (الجامع لأحكام القُرآن)[1]دا، دەڵێ: ((وَلَيْسَ القِصَاصُ بِلازم إنَّمَا اللازم ألاّ يَتجَاوَزَ القِصَاصُ وَغَيْرُهُ مِنَ الحدُودِ إلى الإعتدَاء، فَأَمَّا إذَا وَقَعَ الرِّضَا بِدُونَ القِصَاص مِنْ دِية وَعَفُو، فَذَلِكَ مُبَاح))، واتە: تۆڵەستادنەوە فەرز نیە کە هەر بستێنلرێتەوە، بەڵام هەقی تەرەفی نەفەر لێ کوژراوەو، ئەگەر بیەوێ دەتوانێ، بەڵێ پێویستە کە لە تۆڵە زیاتر کابرا چاوی لە دەستدرێژیی نەبێ، وە لە هەموو سنوورە شەرعییەکانی دیکەشدا بەهەمان شێوە، بەڵام ئەگەر تەرەفی نەفەر لێکوژراو ڕازی بوون بەوەی عەفووی بکەن، یان خوێن وەربگرن، ئەوە بۆیان هەیە، وە کە دەفەرموێ: ﴿كُتِبَ عَلَيْكُمُ الْقِصَاصُ فِي الْقَتْلَى ﴾ (كُتِبَ) یانی: (فُرِضَ) واجب بووە، یانی: ئەگەر تەرەفی لێکوژراو ویستیان واجبە، واتە: واجبە لەسەر بکوژ کە ملی خۆی بۆ چەقۆی شەرع ڕابگرێ، یانی: لەسەر بکوژ فەرزە نەك لەسەر لێکوژراوەکان واجب بێ حەتمەن هەر تۆڵە بکەنەوە، بەڵکو دەتوانن خوێن وەربگرن‌و دەتوانن عەفووشی بکەن،

---

١) (الجامع لأحكام القرآن)، ج: (٢)، ص: (١٦٢)، ط: (١) ١٤٢٩، دار الفكر، و طبعة المكتبة التوفيقية، ج: (٢)، ص: (٢١٨).

هەروەها لەسەر کۆمەڵگاو فەوارەی مسوڵمانان فەرزن مادام بابای خاوەن خوێن بیەوێ، کە یاریدەی بدەن تۆڵەی خۆی بکاتەوە.

**مەسەلەی حەوتەم:** لە تۆڵەدا دروست نیە جگە لە بکوژ کەسی دیکە بکوژرێتەوەو، دەبێ بەس بکوژ (قاتل) بکوژرێتەوە، بۆچی؟ خوا ﷻ لە سوورەتی (المائدة)دا دەفەرموێ: ﴿ وَكَتَبۡنَا عَلَيۡهِمۡ فِيهَآ أَنَّ ٱلنَّفۡسَ بِٱلنَّفۡسِ ...﴿٤٥﴾ ﴾، واتە: لە (تەورات)دا لەسەرمان نووسیبوون هەر نەفسێك نەفسێكی دیكەی كوشت، دەكوژرێتەوە[1]، مانای وایە غەیری نەفسی بکوژەکە بۆی نیە نەفسی دیکە بکوژێ، ئنجا پێغەمبەر ﷺ لە فەرمایشتێکدا فەرموویەتی: {(إِنَّ مِنْ أَعْتَى النَّاسِ عَلَى اللَّهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ ثَلَاثَةً: رَجُلٌ قَتَلَ غَيْرَ قَاتِلِهِ، وَرَجُلٌ قَتَلَ فِي الْحَرَمِ، وَرَجُلٌ أَخَذَ بِذُحُولِ الْجَاهِلِيَّةِ) (رَوَاهُ أَحْمَد، وَالطَّبَرَانِي، عَنْ أَبِي شُرَيْحٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، وَرِجَالُهُ رجال الصحيح كَمَا قَالَ الهَيْثَمي في الزَّوائد}، واتە: خۆ بەزلگرترین کەس یان ستەمکارترین کەس لەلای خوا لە ڕۆژی دواییدا، سێ جۆرە کەسن: پیاوێك کە کەسێکی کوشتوە غەیری بکوژەکە، (واتە: برای کوژراو، کوڕی کوژراو، بابی، خزمو کەسی کوژراو، ناچێ بکوژەکە بکوژێتەوە، دەچێ برایەکەی، ئامۆزایەکەی، خزمەکەی دەکوژێ، ئەوە لای خوا لە ڕۆژی دوایی لە هەموو کەس ستەمکارترە)، وە یەکێك کە کەسێك دەکوژێ لە حەرەمدا، (لە حەرەمی مەککە یان لە حەرەمی مەدینەدا)، وە کەسێك کە بەهۆی (خوێنی) تۆڵەی سەردەمی جاهیلی یەوە کەسێك دەکوژێ، (تۆڵەی ئەو کاتی دەکاتەوە) ئەوانە ئەو سێ جۆرە کەسە لە هەموو کەس لەلای خوا بوغزێنراوترن، وە ستەمکارترن.

---

١) بڕوانە (التفسير التطبيقي للكتاب المقدّس)، العهد القديم، سفر الخروج، الإصحاح: (٢١)، ص: (١٧٥)، کە دەڵێ: (ولكن إذا تأخّرَ أحدٌ على آخر وتعمَّد قَتْلَهُ فَسَقمْهُ للموت، حتى ولو اهتمى بمَذبحي).

کە دیارە ئەمە یەکێکە لەو شتانەی وەك خۆی لە تەوراتدا ماوەو نەگۆڕاوە.

**مەسەلەی هەشتەم:** زانایان دەربارەی ئەوە کە ئایا، ئەگەر مسولّمانێك کافرێکی کوشت، یانی: کافرێکی ژێر سایەی دەولّەتی ئیسلامیی، ئایا پێی دەکوژرێتەوە، یان نا؟ ئەوە لەلایەك، وە ئەگەر کەسێکی ئازاد کۆیلەیەکی کوشت، ئایا دەکوژرێتەوە یان نا ؟ زانایانی ئیسلام لەوبارەوە ڕا جیاییان هەیە: وە من هەر لە سەرەتاوە دەلّێم: ڕام لەگەلّ ئەو زانایانە دایە کە دەلّێن: دەکوژرێتەوە، مادام خوا فەرموویەتی: ﴿ وَكَتَبْنَا عَلَيْهِمْ فِيهَآ أَنَّ ٱلنَّفْسَ بِٱلنَّفْسِ ... ﴿٤٥﴾ ﴾ المائدة، وە لێرەش دەفەرموێ: ﴿ كُتِبَ عَلَيْكُمُ ٱلْقِصَاصُ فِى ٱلْقَتْلَى ﴾، وە لە سوورەتی (المائدة)ش دەفەرموێ: ﴿ مِنْ أَجْلِ ذَٰلِكَ كَتَبْنَا عَلَىٰ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ أَنَّهُۥ مَن قَتَلَ نَفْسًۢا بِغَيْرِ نَفْسٍ ...﴿٣٢﴾ ﴾ المائدة، هەموو ئەم ئایەتانە بەڕاستی ئەوە دەگەیەنن کە نەفس جیاوازیی نیە، کۆیلەیە، ئازادە، مسولّمانە، کافرە، هەرکەسێکی هەیە، هەر کەس نەفسێکی کوشت، دەبێت بکوژرێتەوە، ئەوە ڕای ئەبو حەنیفەو هاوەلّەکانیەتی، واتە: ئەبو یووسوفو موحەممەدی کوڕی حەسەن، وە ڕای (ثوري)و (ابن أبي ليلى)و (داود الظاهري)یە، هەروەها ئەوە گێڕراوەتەوە لە عەلی کوڕی ئەبو طالیبو لە عەبدوللّای کوڕی مەسعوودو سەعیدی کوڕی موسەییبو قەتادەو ئیبراهیمی نەخەعییو حەکەمی کوڕی عویەینە[1]، ئەوانە هەموویان ڕایان وایە کە ئەگەر کەسێك کەسێکی کوشت، دەبێ بکوژرێتەوەو تۆلّەی دەچێتە سەرێ، ئەگەر تەرەفی کوژراوەکە داوایان کرد، با بکوژەکە ئازاد بێو کوژراوەکە کۆیلە بێ، یاخود بکوژەکە مسولّمان بێو کوژراوەکە کافری (ذِمّي) بێ، بۆیەش دەلّێین: کافری (ذِمّي) چونکە کافری (حَرْبِّي) وەك دوایی باسی دەکەین، ئەوە دیارە کە مسولّمانان لە بەرانبەر کافراندا ناکوژرێنەوە مادام لەم جەنگە دابن دژی ئیسلامو مسولّمانان، بەلاّم زۆربەی زانایان ڕایان وایە کە ئازاد لە بەرامبەری کۆیلەدا

---

١) (الجامع لأحكام القرآن)، ج: (٢)، ص: (٤٩١)، و طبعة المكتبة التوفيقية، ج: (٢)، ص: (٢١٩).

ناکوژرێتەوە، وە مسولْمانیش بە هۆی کافری (ذِمِّـي) {واتە: نا مسولْمانێك کە لە وڵاتی مسولْماناندا دادەنیشێ، جوولەکەیە، نەصرانیی یە، چی و چییە ناکوژرێتەوە}. ئێستاش با سەرنجی بەڵگەکانی هەرکام لەو دوو ڕایە بدەین:

**بەڵگەی ئەوانەی دەڵێن دەبێ بکوژرێتەوە:**

یەکەم: کە خوا لە سوورەتی (البقرة)دا فەرموویەتی: ﴿كُتِبَ عَلَيْكُمُ ٱلْقِصَاصُ فِي ٱلْقَتْلَى﴾، وەك دەبینین بەگشتی فەرموویەتی: هەموو کوژراوەکان تۆڵەستاندنەوەیان لەسەر موسڵمانان تێدا نووسراوە.

دووەم: وە لە سوورەتی (المائدة)دا کە فەرموویەتی: ﴿وَكَتَبْنَا عَلَيْهِمْ فِيهَآ أَنَّ ٱلنَّفْسَ بِٱلنَّفْسِ ... ﴿٤٥﴾﴾، دیسان حوکمەکە گشتییەو هیچ هەڵاواردنی تێدانییە.

سێیەم: وە لە سوورەتی (المائدة)دا کە فەرموویەتی: ﴿... مَن قَتَلَ نَفْسًۢا بِغَيْرِ نَفْسٍ أَوْ فَسَادٍ فِي ٱلْأَرْضِ فَكَأَنَّمَا قَتَلَ ٱلنَّاسَ جَمِيعًا ...﴿٣٢﴾﴾، دیسان بە گشتی باسی نەفسەکانی کردوە.

چوارەم: وە لە سوورەتی (الإسراء)دا کە فەرموویەتی: ﴿وَلَا تَقْتُلُوا۟ ٱلنَّفْسَ ٱلَّتِي حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلْحَقِّ ۗ وَمَن قُتِلَ مَظْلُومًا فَقَدْ جَعَلْنَا لِوَلِيِّهِۦ سُلْطَٰنًا فَلَا يُسْرِف فِّي ٱلْقَتْلِ ۖ إِنَّهُۥ كَانَ مَنصُورًا ﴿٣٣﴾﴾ الإسراء، دیسان بە گشتی فەرموویەتی: هەر کەسێك بە ستەم بکوژرێ بۆ تۆڵە وەرگرتنەوە دەسەڵاتمان داوەتە کەس و کارەکەی، بەڵام: ﴿فَلَا يُسْرِف فِّي ٱلْقَتْلِ﴾، با زێدەڕۆیی نەکات، واتە: غەیری بکوژەکە نەکوژێتەوە.

پێنجەم: وە ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەر ﷺ هەیە لەوبارەوە، کە دەفەرموێ: {(الْمُؤْمِنُونَ تَتَكَافَأُ دِمَاؤُهُمْ وَهُمْ يَدٌ عَلَى مَنْ سِوَاهُمْ وَيَسْعَى بِذِمَّتِهِمْ أَدْنَاهُمْ) (رَوَاهُ أَحْمَد بِرقم: (٩٩١)، وَأَبُو دَاوُدَ بِرقم: (٤٥٣٠)، وَالحَاكِمُ

برقم: (٢٦٢٣)، وَأَبُو يعلى برقم: (٣٣٨)، عَنْ عَلِيّ بْنِ أَبِي طَالِب، وعَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبِ عَنْ أَبِيهِ عَنْ جَدِّهِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ، وَصَحَّحَهُ الألباني في (إرواء الغليل) برقم: (٢٢٠٩)}، واتە: مسوڵمانان خوێنیان وەك یەكە، وە هەموویان یەك دەستن لەسەر بەرانبەر نەیارانیاندا، بچوكترینیان دەتوانێ ئۆباڵی هەموویان هەڵبگرێ.

شەشەم: هەروەها (الطحاوي) لە (محمد بن المنكدر) گێڕاویەتەوە: {(أَنَّ النَّبِيّ ﷺ أَقَادَ مُسْلِماً بِذِمِّي، وَقَالَ أَنَا أَحَقُّ مَنْ وَفَّي بِذِمَّتِهِ) (رَوَاهُ الدارقُطني برقم: (١٦٦)، في كتاب الحدود)، واتە: پێغەمبەر ﷺ مسوڵمانێكی كوشت بە هۆی ئەوەی كە (ذِمِّي)یەكی كوشتبوو (واتە: جوولەكەیەك یان نەصرانیی یەك)، وە فەرمووی: من شایستەترین كەسم و لە پێشترین كەسم كە ئەو پەیمانەی داومە جێبەجێی بكەم.

**بەڵگەی ئەوانەی دەڵێن: ناكوژرێتەوە:**

یەكەم: ئەو فەرمایشتەیە كە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {(لاَ يُقْتَلُ مُسْلِمٌ بِكَافِرٍ) (رَوَاهُ أَحْمَد برقم: (٥٩٩)، وَالبُخَارِيُّ برقم: (١١١)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٢٦٥٨)، عَنْ أَبِي جُحَيْفَةَ رضي الله عنه، وَصَحَّحَهُ الألباني في (إرواء الغليل) برقم: (٢٢٠٩)}، واتە: مسوڵمان بە كافر ناكوژرێتەوە، یانی: ئەگەر مسوڵمانێك كافرێكی كوشت، نابێ بكوژرێتەوە.

دووەم: ئەو فەرمایشتەیە كە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {(أَلاَ لاَ يُقْتَلُ مُؤْمِنٌ بِكَافِرٍ وَلاَ ذُو عَهْدٍ فِي عَهْدِهِ...) (رَوَاهُ أَحْمَد برقم: (٩٩١)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٤٥٣٠)، وَالنَّسَائِيُّ برقم: (٤٧٣٤)، عَنْ عَلِيّ بْنِ أَبِي طَالِب رضي الله عنه، وَصَحَّحَهُ الأَلباني في (إرواء الغليل) برقم: (٢٢٠٩)}، واتە: ئاگاداربن مسوڵمان بە هۆی كوشتنی كافرێكەوە ناكوژرێتەوە، هەروەها كەسێكیش كە پەیمانی لەگەڵ مسوڵماناندا هەیە، بە هۆی كوشتنی كافرێكەوە ناكوژرێتەوە.

بەڵام ئەوانیدیكە (واتە: ئەو زانایانەی كە ڕای یەكەمیان هەیە)، وەڵامدەدەنەوەو بەڕاستی وەڵامەكەشیان بەڕای من زۆر بەهێزە، دەڵێن: مەبەست لە كافر لەو فەرموودەیەدا كە دەفەرموێ: مسوڵمان بە كافر ناكوژرێ، كافری جەنگیی (الكافر الحربي)یە، نەك كافرێك كە لە وڵاتی مسوڵمانانـدا دانیشتوەو هاووڵاتییە، كافرێك كە مسوڵمانان پەیمانیان لەگەڵیدا نیە، و هاووڵاتیش نیە لە وڵاتی مسوڵماناندا، مسوڵمانێك كافرێكی وای كوشت، پێی ناكوژرێتەوە، بۆچی؟ چونكە بابای كافر بە جەنگكردنی‌و سەنگەرگرتنی لە دژی ئیسلام‌و مسوڵمانان خوێنی خۆی حەڵاڵ كردوە، ئایا كەسێك خوێنڕشتنی مسوڵمانان بۆخۆی حەڵاڵ بكات ئەویش خوێنی خۆی حەڵاڵ ناكات؟ بێگومان، با.

ئنجا گێڕراوەتەوە، كە هەر كام لە (عمر بن الخطاب) و (علي بن أبي طالب) خوا لێیان ڕازی بێ مسوڵمانیان كوشتۆتەوە بە كافرێكی خاوەن پەیمان (ذِمِّي)، وە عەلی كوڕی ئەبی طالیب لەوبارەوە گوتوویەتی: {(إِنَّا أَعْطَيْنَاهُم الَّذِي أَعْطَينَاهُم لِتَكُونَ دِمَائُهُمْ كَدِمَائِنا ودِيَاتُهُمْ كَدِيَاتِنَا)، واتە: ئێمە بۆیە ئەو پەیمانەمان پێداون، كە لە وڵاتی ئێمەدا دابنیشین، بۆئەوەی خوێنیان وەك خوێنمان بێ (واتە: لە ڕووی تۆڵەوە) وە خوێن بەهـا (دیة)شیان وەك خوێن بەهامان بێ، جا دیارە ئەو زانایانەی دیكەش لەوبارەوە هەندێك قسەیان پێیە، بەڵام من وەڵامەكانیانم پێ ئیقناعكەر نیە، وە بەڕاستی هەر فەرموودەیەكی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ ئایەتێكدا تێكگیرا، دەبێ بە شێوەیەك تەئویل بكرێ كە لەگەڵ ئایەتەكەدا بگونجێ، چونكە مەعقوول نیەو موستەحیلە پێغەمبەر ﷺ شتێك بفەرموێ، یان بكات، لەگەڵ ئایەتەكانی خوای پەروەردگاردا دژ بووەستێ، ئەوە ئەگەر لە ڕووی سەنەدەوە بۆمان ساغ بۆوە، كە پێغەمبەر ﷺ ئەو شتەی كردوە، یان فەرمووە هەندێ جاریش شتێك دەگوترێ كە لە ڕووی سەنەدەوە ساغ نابێتەوە، چونكە ئێمە قورئان

بە تەواتور پێمان گەیشتوەو یەقینمان هەیە کە هەمووی فەرمایشتی خوایە، کەواتە: ئەوەی پێغەمبەر ﷺ دوای ئەوەی کە یەقینمان پەیدابوو، کە ئەو ﷺ فەرموویەتی، ئەوجار دەبێ بە جۆرێك مانا بکرێ کە لەگەڵ ئایەتەکاندا بگونجێ، بەڵام ئەگەر دڵنیانەبووین پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی، ئەوە ئەوکاتە ئەو کارەشمان لەکۆڵ دەبێتەوە.

**مەسەلەی نۆیەم:** ئایا پیاو بە ئافرەت دەکوژرێتەوە یان نا ؟ هەموو زانایان لەسەر ئەوە یەك دەنگن[1]، جگە لە (الحسن البصري وعطاء والليث بن سعد) ئەوانە تەماشای ڕواڵەتی ئایەتەکەیان کردوە، کە دەفەرموێ: ﴿ وَٱلۡأُنثَىٰ بِٱلۡأُنثَىٰ ﴾، کە باسمان کرد لەڕاستیدا ئەگەر وابێ، دەبێ ئەگەر ئافرەتێك پیاوێکی کوشت، ئافرەتەکەش نەکوژرێتەوە ! وە ئەگەر تەماشای ڕواڵەتی ئایەتەکە بکەی، دەبێ ئەگەر کۆیلەیەکیش ئازادێکی کوشت کۆیلەکەش نەکوژرێتەوە، کەواتە: ئایەتەکە ئەگەر بشێ بۆ ئەوە کە پیاو نابێ بە ئافرەت بکوژرێتەوە، وە کۆیلە نابێ بە ئازاد بکوژرێتەوە، دەشێ بۆ ئەوەش کە کۆیلەش ئەگەر ئازادی کوشتو، ئافرەتیش ئەگەر پیاوی کوشت، نابێ هیچیان تۆڵەیان لێ وەربگیرێتەوە !! بەڵام بە دڵنیاییەوە ڕواڵەتی ئایەتەکە مەبەست نیە، کەواتە ڕاستیو هەق هەر ئەوەیە کە بەڵێ: پیاو ئافرەت بکوژێ، یان ئافرەت پیاو بکوژێ، هەر دەکوژرێنەوە، چونکە هەموویان نەفسن، خوای دادگەریش فەرموویەتی: ﴿ وَكَتَبۡنَا عَلَيۡهِمۡ فِيهَآ أَنَّ ٱلنَّفۡسَ بِٱلنَّفۡسِ ...﴿٤٥﴾ ﴾ المائدة.

**مەسەلەی دەیەم:** کە زۆربەی زانایان لەسەری یەك دەنگن، باب بە کوڕی ناکوژرێتەوە، بۆیە کە دەفەرموێ: ﴿كُتِبَ عَلَيۡكُمُ ٱلۡقِصَاصُ فِي ٱلۡقَتۡلَى ﴾، دەگوترێ: بە مەرجێك کوژراوەکە کوڕ نەبێو بکوژەکە باب نەبێ، ئەم حاڵەتە لەو حوکمە گشتییە هەڵاوێرراوە، ئەوە زۆربەی زانایان لەسەری

١) بروانە: (الجامع لأحكام القرآن)، ج: (٢)، ص: (٤٩٢)، کە گوتیویەتی: (وأجمع العلماءُ على قتل الرَّجل بالمرأة، والمرأة بالرجل...).

ڕێککەوتوون ئیمام (مالك) نەبێ ڕەحمەتی خوای لێ بێ، دەڵێ: بە مەرجێك ئەو بابە کوڕەکەی خۆی نەهێنابێ بە لە باریی‌و بە وەستایی بۆی دانیشتبێت‌و سەری بڕیبێ، دەڵێ: کاتێك پێی ناکوژرێتەوە ئەگەر گوچانێکی تێگرتبێ، مستێکی لێدابێ لەکاتی تووڕەییدا، لەو حاڵەتانەدا ئەو بابە ناکوژرێتەوە، ئەگەرنا پێی دەکوژرێتەوە، ئنجا ئەگەر یەکێك بڵێ: ئایا ئەوە لەگەڵ ئایەتەکە تێکناگیرێ؟ دەڵێین: نەخێر، بۆچی؟ چونکە ئایەتەکە بە لەبەرچاوگرتنی حاڵەتی ئاسایی هاتۆتە خوارێ‌و حاڵەتی ئاسایی خەڵکیش ئەوەیە کە یەك دەکوژن، ئنجا نەبۆتە عادەت کوڕ باب بیکوژێ، بەڵام سەرجەم زانایان لەسەر ئەوە یەکدەنگن کە ئەگەر کوڕ بابی خۆی کوشت، پێی دەکوژرێتەوە. هەڵبەتە وەك پێشتر گوتمان هەندێکیش لە زانایان ڕایان وایە ئەگەر بابیش کوڕی کوشت، هەر دەکوژرێتەوە[1]، چونکە خوا بە گشتی وای فەرمووە، بەڵام وەك گوتم زۆربەی زانایان ڕایان وانیەو هەرچۆن بێ ئەم مەسەلەیە ڕاجیایی‌و مشتومڕی تێدایەو منیش زیاتر مەیلم بەلای ئەو ڕایەدایە کە هەرکەسێك کەسێکی کوشت، پێی دەکوژرێتەوە، چونکە ئایەتەکان بەگشتی وایان فەرمووەو هەڵاواردنیان تێنەخستوە، سەربارەش فەرموودەیەکی جێی متمانە لەوبارەوە نیە کە باب (أب)ی هەڵاوردبێ‌و، ئەگەر گریمان ببووایەش زۆرێك لە زانایان ڕایان وایە کە ناگونجێ بە فەرموودەی (آحاد) قورئان تایبەت (تخصیص) یان بەندداار (مقیَّد) بکرێ .

**مەسەلەی یازدەیەم:** ئایا کۆمەڵێك دەکوژرێنەوە بە یەکێك، ئەگەر کۆمەڵێك لەسەر کوشتنی یەکێك ڕێککەوتن‌و بەشداربوون تێیدا، ئایا هەموویان دەکوژرێنەوە؟ ئەوەش هەموو زانایان جگە لە ظاهیرییەکان لەسەر ئەوە یەك دەنگن، کە بەڵێ، چونکە بوخاریی گێڕاویەتەوە، دەڵێ[2]: {(قَتَلَ عُمَرَ

---

١) بڕوانە : سەرچاوەی پێشوو، ج: (٢)، ص: (٤٩٣، ٤٩٤).

٢) ذكره البخاري معلَّقاً: (٦٨٩٦)، باب (٢١)، إذا أصاب قومٌ من رجلٍ هل يُعاقَبُ أم يُقتَصُّ منهم كلُّهُم؟، و رواه البيهقي موصولاً من طريق سعيد بن المسيَّب: (٤١/٨)، بڕوانە: سەرچاوەی پێشوو، ج: (٢)، ص: (٤٩٤).

بْنَ الْخَطَّابِ خَمْسةَ أَوْ سَبْعَةً بِرَجُلٍ وَاحِدٍ، وَقَالَ عُمَرُ لَوْ تَمَالأَ عَلَيْهِ أَهْلُ صَنْعَاءَ لَقَتَلْتُهُمْ بِهِ جَمِيعًا)، رَوَاهُ مالك والبُخاري عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ. (وَقَتَلَ عَلَيّ الحرُورِيَةَ بعَبدِ اللهِ بن خَبَّاب)}، واتە: عومەری کوڕی خەتتاب، پێنج یان حەوت پیاو لە خەڵکی (صَنعَاء) {یەمەن}ی کە پیاوێکیان کوشتبوو هەر حەوتیانی کوشتەوەو گوتی: ئەگەر هەموو خەڵکی (صَنعَاء) لەسەری رێککەوتبان بیکوژن، هەموویانم پێ دەکوشتنەوە، واتە: دیارە بۆیەش حەوت نەفەر رێککەوتوون تاکو خوێنەکەی بڵاوبکەن، بیستوومە کە عەشیرەتی واهەیە گوتوویانە: ئێمە لە عەشیرەتی بەرانبەرمان دەکوژین‌و یەکی دیناریکمان دەگاتێ لە خوێنەکەی !! واتە: هێندە زۆرین ! بەڵام ئەگەر شەریعەتی ئیسلامیی حاکم بێت، دەڵێ: بێنن چەند کەس تێیدا بەشداربوون، هەمووان بکوژنەوە، داخۆ دەوێرن ئاوا بە پازدەو بیست بێن کەین‌و بەین بکەن‌و رێك بکەون‌و نەفەرێك بکوژن ؟!

ئنجا عەلی کوڕی ئەبی طالیب جەنگی لەگەڵ خەواریج کرد زۆری لێ کوشتن لەسەر عەبدوڵڵای کوڕی خەبباب کە یەکێك بوو لە هاوەڵان خوا لێیان رازی بێ‌و خۆیشی‌و خێزانەکەشیان شەهید کرد، وە پێغەمبەر ﷺ لە فەرمایشیکدا دەفەرموێ: {(لَوْ أَنَّ أَهْلَ السَّمَاءِ وَأَهْلَ الأَرْضِ اشْتَرَكُوا فِي دَمِ مُؤْمِنٍ لأَكَبَّهُمُ اللَّهُ فِي النَّارِ) (رَوَاهُ التِّرمِذِيّ برقم: (١٣٩٨)، عَن أَبي سَعِيدٍ الْخُدْرِيَّ، وَأَبَا هُرَيْرَةَ، وَصَحَّحَهُ الأَلباني في (سُنَن التِّرمِذِي))}، واتە: ئەگەر خەڵکی ئاسمان‌و خەڵکی زەوی بەشداربن لە رشتنی خوێنی ئیماندارێکدا، خوا هەموویان لەپەڕوو لە ئاگر داوێ، وشەی: (لَوْ) یانی: ئەگەر، لە زمانی کوردییدا، جا ئەگەر یەکێك بڵێ: جا خۆ خەڵکی ئاسمان کە فریشتەکانن، خەڵکی ناکوژن ! وەڵامەکەی ئەوەیە، یانی: گریمان ئەگەر ئەهلی ئەرزو ئاسمانان کۆببنەوە لەسەر کوشتنی نەفەرێك، خوای دادگەر هەموویان سزا دەدا، کەواتە: دەبێ سزای دنیاشیان بەسەردا بچەسپێ.

**مەسەلەی دوازدەیەم:** چۆنیەتی کوشتنەوەکە، دەبێ چۆن بێت؟ لەبارەی چۆنیەتی کوشتنەوەوە زانایان بوونە دوو ڕا: (مالک و شافعي) دەڵێن: دەبێ چۆنی کوشتوە، ئاوا بکوژرێتەوەو بەڵگەشیان ئەم فەرموودەیە: {(أنَّ النَّبيَّ ﷺ رَضَّ رَأسَ يَهُوديّ بَيْنَ حَجَرَيْنِ كَانَ قَتَل بِهِمَا جَارِيَةً مِنَ الأَنصَار) (رَوَاهُ البُخَارِي وَمُسْلِمٌ عَنْ أَنَسٍ ﷺ)، واتە: پێغەمبەر ﷺ سەری جوولەکەیەکی لەنێوان دوو بەردان پانکردەوە، چونکە ئەو جوولەکەیە سەری کچێکی ئەنصاریی لەنێوان ئەو دوو بەردەدا پانکردبۆوە.

بەڵام حەنەفییەکانو حەمبەلییەکان وە زۆربەی زانایان دەڵێن: وەك یەکبوونی کوشتنەوەکە پێویست نیە، بەڵکو گرنگ ئەوەیە بکوژرێتەوە، بەڵگەشیان ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەرە ﷺ کە دەفەرموێ: {(إنَّ اللّهَ كَتَبَ الإِحْسَانَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ، فَإِذَا قَتَلْتُمْ فَأَحْسِنُوا الْقِتْلَةَ، وَإِذَا ذَبَحْتُمْ فَأَحْسِنُوا الذَّبْحَ) (رَوَاهُ مُسْلِم برقم: (٥٠٢٨)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٢٨١٥)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (١٤٠٩)، وَقَالَ: حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَالنَّسَائِيُّ برقم: (٤٤١٧)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٣١٧٠)، عَنْ شَدَّادِ بْنِ أَوْسٍ ﷺ}، واتە: خوا چاك ئەنجامدانی لەسەر هەموو شتێك نووسیوە، جا ئەگەر شتێکتان کوشت جوانی بکوژن، وە ئەگەر شتێکتان سەربڕی جوانی سەربڕن، کەواتە: چۆن بە ئاسانترین شێوە ئەو ئینسانە گیانی دەردەچێ، پێویستە ئاوا بکوژرێتەوە، منیش بەڕاستی ئەم ڕایەم پێ پەسندترو ڕاستترە، وە لەگەڵ ڕووحی شەریعەتی ئیسلامدا زیاتر دەگونجێ و گرنگ ئەوەیە تۆڵەکە بێتەدی.

**مەسەلەی سێزدەیەم:** ئایا ئەم ئایەتە، کە خوا دەفەرموێ: ﴿ كُتِبَ عَلَيْكُمْ إِذَا حَضَرَ أَحَدَكُمُ ٱلْمَوْتُ إِن تَرَكَ خَيْرًا ٱلْوَصِيَّةُ لِلْوَٰلِدَيْنِ وَٱلْأَقْرَبِينَ بِٱلْمَعْرُوفِ حَقًّا عَلَى ٱلْمُتَّقِينَ ﴾، واتە: وەسیەتتان لەسەر پێویست کراوە، هەرکاتێك یەکێکتان مردنی گەیشتە سەرێ، ئەگەر ماڵێکی بەجێدەهێشت، کە وەسیەت بکات بۆ باب و دایکی و بۆ خزمان بە شێوەیەکی پەسند، ئەوە هەقێکە لەسەر

پارێزکـاران. ئایـا ئـەم ئایەتـە، ئایەتێکـی (مُحْكَـم)ە، یاخـود ئایـەتێکـی (مَنْسـوخ)ە؟ زۆر لـە زانـایان ئـەم ئایەتـەیان بـە (مَنْسـوخ) دانـاوە، دیـارە هەنـدێکیش بـە (مُحكَـم)یـان دانـاوە، جـا ئێمـە لـەم مەسـەلەیەدا ئـەم بابەتـە دەتوێژینەوەو سەرەتاش بە کورتی لەبارەی (مَنْسوخ)و (مُحْكَم)ەوە دەڵێین:

(مَنْسـوخ): واتـە: ئـەم ئایەتـە هەرچـەندە بێژەکـانی ماونەتـەوە، بـەڵام وەك حوکمو کـارپێکـردنی لابـراوە.

(مُحْكَـمَ): واتـە: ئایەتەکە هـەر لـە شـوێنی خۆیـەتیو وەك چـۆن بێژەکـانی مـاون، نێـوەڕۆكو حوکـمو کارپێکـردنیشی هەر لەجێی خۆیـەتی.

جا دیـارە من ڕای دووەمـم پـێ ڕاسـتە، نـەك هـەر بـە نـسبەت ئـەم ئایەتـەوە، وەك لـە دەرسـەکانی ڕابـردوودا گوتوومانـە، بـەڵکو بەنـسبەت هـەموو ئـەو ئایەتـانەی دیکـەوە کـە کـەمو زۆر لـەنێو توێـژەرەوانی قورئانـدا مـشتومڕیـان لەسەرە کە نەسخ کرابنـەوە، یـاخود نەسخ نەکرابنـەوە، وە مـن پـێم وایـە وەك چەندان جار گوتوومانـە: هـیچ ئایـەتێك ئێـستاکە لـەم قورئـانو (مـصحف)ەی بەردەسـتمان دا نیــە، کـە (مَنْسـوخ)بێو کـاری پێنـەکرێ، ئنجـا بـا تەماشـا بکەین، داخۆ ئەم ئایەتە زانایـان چۆنیان قـسە لەسـەر کـردوە؟ (القُرطُبي) لـە تەفـسیـرەکەیدا بـە شـێوەیەکی پوختـە (خُلاصَـة) هێناویـەتیو دەڵـێ[1]:

{(فقِيـلَ هـي مُحكَمَـةٌ ظـاهرها العمـوم، و مَعناهَـا الخُـصوصُ فـي الوَالِـدَين الَّذين لايَرِثـانِ كَالكَافرينِ وَالعَبدَين وبِسَبَب القَتْلِ، وفـي القَرَابة غَيـر الوَرَثة قَالَهُ الضَّحَّاك وَطَاوس والحسـن وَ اختـارهُ الطبَـري، وَعَنِ الزُهـري أن الوَصيَة وَاجبَة فِيما قَلَّ أَوْ كَـثُر، وَقَـالَ إِبْنُ الـمُنذِر أَجْمَـعَ كُـلُّ مَـن يُحْـفَظُ عَنْـهُ مِنْ أَهْـلِ العِلْـمِ عَلَـى أَنَّ الوَصـيَة للوَالِدَيــن الـّذين لايَرِثــانِ وَالأَقرَبَــاءِ الَّـذِينَ لا يَرِثُـونَ، جَـائِزَةٌ)}، واتـە: ڕایــەك هــەیە دەڵــێ ئـەم ئایەتـە موحکەمـە،{واتـە: (مَنْسـوخ) نیەو کـاری پـێ دەکرێ} بەڵام ماناکـەی تایبەتە بـەو دایـكو بابانـەی

١) سەرچاوەی پێشوو، ج: (٢)، ص: (٥٠١، ٥٠٢).

کە میرات ناگرن، وەك دایكو بابێکی کافر، {ئینسانێکی مسولمان هەیە، کورێکە، کچێکە، دایكو بابی کافرن، واتە: بۆ خۆی مسولمان بووە دایكو بابی جوولەکەن، یان نەصرانیین، یان هاوبەش بۆ خوا دانەرن، یان مولحیدن یان هەرچی هەن، دیارە کافر میرات لە مسولمان ناگرێ، جا ئەم وەسیەتە بۆ ئەو دایكو بابانەیە} هەروەها دایكو باب کە کۆیلە بن دیسان میرات لە منداڵێکی ئازاد ناگرن، هەروەها بابو دایکێك کە بە هۆی ئەوەوە کە منداڵەکەی خۆیانیان کوشتوە، میراتی لێناگرن، وە خزمانێك کە میراتگر نەبن، وەسیەتیان بۆ دەکرێ، ئەوە ڕای ضەححاكو طاووسو حەسەنی بەسرییەو تەبەرییش ئەم ڕایەی هەڵبژاردوە، وە زوهریی دەڵێ: هەرکەس مرد ماڵی لەپاش بەجێما، فەرزە لەسەری وەسیەت بکات، کەم بێ یان زۆر بێ، (ابن المُنذر)یش دەڵێ: هەموو ئەوانەی کە زانیارییان لێوەرگیراوەو، قسەیان لێ ڕیوایەت کراوە لە زانایان، لەسەر ئەوە یەك دەنگن کە بابو دایکێك، وە خزمانێك کە میرات ناگرن، وەسیەتکردنیان بۆ دروستە.

ئنجا ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەر ﷺ کە فەرموویەتی: {(إِنَّ اللهَ قَدْ أَعْطَى لِكُلِّ ذِي حَقٍّ حَقَّهُ فَلاَ وَصِيَّةَ لِوَارِثٍ) (رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ برقم: (٢٨٧٠)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٢٧١٤)، عَنْ أَبَا أُمَامَةَ رضي الله عنه، وَصَحَّحَهُ الأَلْبَانِي في (إرواء الغليل) برقم: (١٦٥٥)}، واتە: بێگومان خوا مافی هەموو خاوەن مافێکی داوەو میراتگر وەسیەتی بۆ ناکرێ. ئەوە لێرەدا مەبەست کەسێکە کە میرات بگرێ دروست نیە وەسیەتی بۆ بکرێ، بۆ نموونە: بابێك کە خەریکە بمرێ، نابێ وەسیەت بکات بۆ میراتگرێك، بەڵکو دەبێ وەسیەتەکە بکات بۆ خزمانێك کە میرات ناگرن، ئنجا ڕایەکی دیکەی توێژەرەوانی قورئان هەیە کە یەکێك لەوانە (أبو مُسلم الأصفهاني)یە ڕەحمەتی خوای لێ بێ، کە ئەو پێی وایە (نَسْخ) لە قورئاندا هەر نیە، ئەم ئایەتە بە دوو شێوەی دیکە مانا دەکاتو بە دوو شێوە ماناکردنەش هیچ پێویست ناکات باسی نەسخ بکرێ: مانایەکیان ئەوەیە دەڵێ: ((مَعْنَى هَذِهِ الآيةِ: كُتِبَ عَلَيْكُم ما أَوْصَى بِهِ اللهُ تَعَالَى مِن

تَوْرِيثِ الوَالِدَيـنِ وَالأَقْرَبِينَ مِن قَولِهِ: ﴿ يُوصِيكُمُ ٱللَّهُ فِىٓ أَوۡلَـٰدِكُمۡۖ لِلذَّكَرِ مِثۡلُ حَظِّ ٱلۡأُنثَيَيۡنِ ... ﴿١١﴾ ﴾ النساء، أَوْ كُتِبَ عَلَى الـمُحتَضَرِ أي يُوصي لِلوَالِـدَينِ وَالأَقرَبِينَ بتوفر ما أَوْصَى بـهِ الله عَلَيْهِم أَنْ لاَ يُنْقَـصَ مِن أَنْصِبائِهم))، واتـه: مانای ئەم ئایـەتە: ئێوە لەسـەرتان پێویسـت کراوە ئـەوەی کـە خـوا وەسـیەتی پێکردوون، بدرێ بە بـابو دایـكو بـە خزمـان لـە سـوورەتی (النسـاء)دا، پێیـان بدرێ، کە دەفـەرموێ: ﴿ يُوصِيكُمُ ٱللَّهُ فِىٓ أَوۡلَـٰدِكُمۡۖ لِلذَّكَرِ مِثۡلُ حَظِّ ٱلۡأُنثَيَيۡنِ ... ﴿١١﴾ ﴾ النسـاء، تا کۆتایی ئایەتەکە، واتـە: ئـەوەی کـە خـوا لەوێـدا وەسـیەتی کردوە، خوا لەسـەری پێویست کردوون، کە ئەو وەسیەتە جێـبەجێ بکەن {ئەوە مانـای یەکـەمی}.

{مانـای دووەمــی} یــان مەبەســت پێــی ئەوەیــە کەســێك کــە کەوتۆتــە سەروحەدی مردن لەسـەری پێویست کراوە، کـە ڕاسـپێرێ بـۆ بـابو دایـكو بـۆ خزمــان، ئــەوەی کــە خــوا وەســیەتی پێکــردوەو ئامۆژگــاریی پــێ کــردوە {لــە ســوورەتی (النســاء)دا}، پێیــان بــدرێ هــەر کــەس بــەو پێیــەی، کــە خــوا بــۆی دیاریکردوە، میـراتی خـۆی وەربگـرێو لێیان کـەم نـەکرێتەوە.

ئنجـا (أبـو مـسـلم الأصـفهاني) دەڵـێ: {(وَلاَ منافـاة بَـيْنَ ثُبـوتِ الـمِيـرَاث ِللإقرَبـاءِ مَعَ ثُبُوت الوَصَيَة فالمِيـراثُ عَطِيَة مِنَ اللهِ تَعَالـى، وَالوَصية عَطية مِمَّن حَضَرَهُ الـمَوْتُ)} {ئێمە لە دەرسـەکانی ڕابردوودا باسمان کـرد کـە (نَسْخ) ئەوەیە لەنێوان دوو ئایەتی قورئاندا تێکگیـرانێك هەبێ کە چار نـەکرێ، واتـە: تێکگیــرانێکی وەهابــێ ناچــاربین بڵــێین: یەکێکــیان (مَنْسـوخ)ەو ئەویدکــە (ناسـخ)ە}، ئنجا لێرەدا (أبو مسـلم) دەڵێ: لـەنێوان ئـەوەدا کە مـیـرات دیاری کراوە بۆ خزمان، لەگـەڵ ئـەوە کـە وەسیەت بکرێ بـۆ خزمـان، تێکگیــران نیـە، چونکە میـراتەکە بەخششی خوایەو، وەسیەتەکەش بەخششی ئەو کەسـەیە کـە خەریکـە بمـرێ. بـۆ وێنـە: دایـكو بـاب هەرکـامیان شـەش یـەك دەگـرن لـە کـوڕیان یان لە کچیان کە دەمرێ، ئەگەر منداڵی هەبێ، جا ئـەو کوڕە یـان ئـەو

کچە دەتوانێ وەسیەت بکات بڵێ: وێڕای شەش یەك لەسێیەکی ماڵدا، ئەو ئەندازەیەی دیکەش بدرێ بە بابم‌و، ئەو ئەندازەیەی دیکەش بدرێ بە دایکم، کەواتە: تێکگیران نیە لەنێوان ئەوەدا کە میراتیش بگیرێ‌و وەسیەتیش بۆ ئەو ئینسانە بکرێ، کە زیاد لە میراتیش ئەندازەیەکی دیکەشی بدرێتێ.

ئنجا گریمان ئەگەر تێکگیرانیش هەبێ، واتە: ئەو فەرمایشتەی پێغەمبەر ﷺ بە بەڵگەی بهێنرێتەوە کە فەرموویەتی: {(إِنَّ اللهَ قَدْ أَعْطَى لِكُلِّ ذِي حَقٍّ حَقَّهُ فَلاَ وَصِيَةَ لِوَارِثٍ) (رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ برقم: (٢٨٧٠)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٢٧١٣)، عَنْ أَبَا أُمَامَةَ رضي الله عنه، وَصَحَّحَهُ الأَلباني في (إرواء الغليل) برقم: (١٦٥٥)} وە ئەگەر فەرموودەکەش ڕاستبێ لە ڕووی سەنەدەوەو قسەی پێغەمبەر ﷺ بێ‌و، دروست نەبێ کەسێك میرات بگرێ، وەسیەتی بۆ بکرێ، دیسان ئێمە هەر ناچارنین بڵێین: ئایەتەکە (مَنْسوخ)ە، بۆچی؟ چونکە: ئەگەر بۆ ئەو خزمە یان دایك‌و بابەی میرات دەگرن، دروست نەبێ وەسیەتیان بۆ بکرێ، بەڵام جۆرە باب‌و دایکی دیکە هەیە، کە کافرن‌و دروستە وەسیەتیان بۆ بکرێ، یان بابێك یان دایکێك کە کوڕەکەی خۆی دەکوژێ، یان کچەکەی دەکوژێ‌و، لەسەر ڕای زۆر لە زانایانیش کوژەر میرات لە کوژراو وەرناگرێ، ئەو کاتە دەکرێ وەسیەتی بۆ بکرێ، دیسان ئەگەر خزمی وا هەن میراتیان بۆ دیاریکراوە، خزمی واش هەن کە میرات ناگرن، وەك خوای پەروەردگاریش باسی کردوە.

(أبو مسلم الأصفهاني) دەڵێ: {(وَلَوْ قدرنا حُصول المُنَافَاة لَكَانَ يُمكِن جَعْلُ آيَةَ المِيراثِ مُخَصِّصَة لِهذِهِ الآيَة، وَذَلِكَ لأَنَّ هَذِهِ الآيَة توجبُ الوَصِيَة لِلأَقرَبِينَ ثُمَّ آيَةَ المِيراثِ تُخْرِجُ الوَارث وَيَبقَى القَريب الذي لايَكون وَارِثاً دَاخلاً تَحْتَ هَذِهِ الآيَة فَكُلُّ مَن كَانَ وَارِثاً لَمْ يَجُز الوَصيَة لَهُ، وَمَنْ لَمْ يَكُن وَارِثاً جَازَت الوَصية لَهُ لأَجْل صِلَة الرَّحِمِ)}، واتە: ئەگەر گریمان، دامانناً ئەم دوو ئایەتە، {ئایەتی ژمارە (١١)ی سوورەتی (النساء)و ئەم ئایەتەی کە ئێستا خەریکی توێژینەوەینی لە سوورەتی (البقرة)} تێکگیرانیشیان لە نێوان هەبێ، ئەوکاتە دەڵێین: ئەو ئایەتەی کە باسی میرات دەکات {لە

سووڕەتی (النساء)دا}، ئەم ئایەتەی ئێرە، کە باسی وەسیەت دەکات تایبەتی (تَخْصِیص)ی دەکات، بەمجۆرە: ئەم ئایەتە وەسیەتکردن بۆ خزمان بە گشتی فەرز دەکات‌و ئایەتی میراتیش ئەوانەی میراتگرن لەو حوکمەیان دەباتە دەرێ‌و، دەمێننەوە ئەو خزمانەی کە میراتناگرن‌و ئەم ئایەتە دەیانگرێتەوە، واتە: هەرکەسێك میرات بگرێ، وەسیەتکردنی بۆ دروست نیە، بەڵام ئەگەر میراتگر نەبوو، دروستە وەسیەتی بۆ بکرێ لەبەر پەیوەندی خزمایەتیی، بە کورتیی: هەموو ئەو خزمانەی کە میرات ناگرن، ئەم ئایەتە کە باسی وەسیەت دەکات دەیانگرێتەوەو دروستە وەسیەتیان بۆ بکرێ، لەبەرچی؟ لەبەر پەیوەندی خزمایەتیی، چونکە: خوا ﷻ لە چەند شوێنێك لە قورئاندا باسی پەیوەندی خزمایەتیی کردوە، کە دەبێ مسوڵمان چاکە لەگەڵ خزماندا بکات، بۆ وێنە: لە سووڕەتی (النساء) ئایەتی ژمارە (١)دا، دەفەرموێ: ﴿ ...وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِی تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلۡأَرۡحَامَۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيۡكُمۡ رَقِيبٗا ﴾، واتە: پارێز لەو خوایە بکەن کە شتی پێ لە یەکتر داوا دەکەن، وە پارێز لە ڕەحم‌و خزمایەتیی بکەن (واتە: مەیپچڕێنن) بێگومان خوا بەسەرتانەوە چاودێرە، هەروەها لە سووڕەتی (النحل) ئایەتی ژمارە (٩٠)دا، دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ يَأۡمُرُ بِٱلۡعَدۡلِ وَٱلۡإِحۡسَٰنِ وَإِيتَآيِٕ ذِی ٱلۡقُرۡبَىٰ ... ﴿٩٠﴾ ﴾، واتە: خوا فەرمان دەکات بە دادگەریی‌و بە چاکەکاریی، وە بە بەخشین بە خزمان، کە لێرەدا بەخشین بە خزمان، واتە: لەڕێی وەسیەتەوە. ئەوەی کە باسمان کرد لە (أبو مسلم الأصفهاني)یەوە (فخرالدین الرازي) لە تەفسیری خۆیدا کە پێی دەگوترێ (التفسیر الكبیر)، هێناویەتی[1].

ئنجا ئێمە ئێستا دەپرسین: ئایا ئەوەی کە ئەم ئایەتەی سووڕەتی (البقرة)ی کە باسی وەسیەت دەکات، (نَسْخ) کردوّتەوە، کام ئایەتەیە؟ ئەگەر مەبەست ئایەتەکەی سووڕەتی (النساء)بێ، ئایەتی ژمارە (١١)، ئەوە تێکناگیرێن،

---

١) بڕوانە: (مفاتیح الغیب) للرازي، ج: (٣)، ص: (٥٣).

چونکە ئەو باسی هەندێك لە خزمان دەكات كە میراتیان بۆ دیاری كراوە، بەڵام خزمی دیكە دەمێننەوە، كە میراتیان بۆ دیاری نەكراوەو وەسیەتەكەش بۆ ئەوانە، ئەوە لەلایەك.

هەروەها وەك گوتم باب‌و دایكیش هەندێك جار میرات ناگرن، دیسان ئەوانیش دەگرێتەوە، كەواتە: لەوێشدا تێكگیران نیەو ناگونجێ بڵێین: ئایەتەكەی سوورەتی (النساء) ئەوەی (البقرة)ی (نَسْخ) كردۆتەوە، وە ئەگەر مەبەست پێی {واتە: (ناسخ)ی ئایەتەكەی (البقرة)} فەرمایشتەكەی پێغەمبەر ﷺ بێ، دەڵێین: یەكەم: فەرمایشتی پێغەمبەرو سوونەتی پێغەمبەر ﷺ لەسەر ڕای زۆرێك لە زانایان، ئەگەر تەنانەت سوونەتی موتەواتیریش بێ، قورئانی پێ (نَسْخ) ناكرێتەوە، وەك (الشافعي و أبو الفرج وسفیان الثوري)و كۆمەڵێك لە زانایان ڕایان وایە[1] و ئەم فەرموودەیەش فەرموودەی (آحاد)ەو موتەواتیر نیە، ئنجا دیسان ناشگونجێ ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەر ﷺ ئایەتەكە (نَسْخ) بكاتەوە تەنانەت لەسەر ڕای ئەوانەش كە دەڵێن: سوونەت قورئان (نَسْخ) دەكاتەوە، چونكە باشە ئەوە دامانناا میراتگرێك كە میرات دەگرێ وەسیەتی بۆ ناكرێ، ئەدی خزمێك كە میرات ناگرێ‌و میراتی بۆ دیاری نەكراوە؟ ئەوكاتە بێگومان دەگونجێ وەسیەتی بۆ بكرێ، دیارە هەندێكیش لە زانایان بۆ وێنە: (القرطبي) گوتوویانە[2]: ئەم ئایەتە كە باسی وەسیەت دەكات، بە كۆ دەنگیی زانایان، (نَسْخ) بۆتەوە، بەڵام بەڕاستی ئەوە شتێكی سەیرە! چونكە كۆدەنگیی زانایان (إجماع العلماء)، ئەوەیە كە لە دوای پێغەمبەر ﷺ لەسەر ڕایەك پێكهاتبن، جا لە دوای پێغەمبەر ﷺ چۆن دەگونجێ قورئان (نَسْخ) بێتەوە؟ بێگومان ئەوە شتێكی زۆر دوورە لە عەقڵ‌و لۆژیك (منطق)ەوە !! كەواتە: كورتەی قسان

---

١) هەمان سەرچاوەو بەرگ‌و لاپەڕە.

٢) (الجامع لأحكام القرآن)، ج: (٢)، ص: (٥٠٢).

ئەوەیە: ئەم ئایەتە موحکەمەو لەجێی خۆی دایەو مەنسووخ نیە، تەنیا ئەوەندە هەیە ئایەتەکەی سوورەتی (النساء) هەندێك کەسی هەڵواردوەو جیای کردۆتەوە، وە حوکمی ئەم ئایەتەی سوورەتی (البقرة)ی تایبەت کردوە بە کەسانێکەوە کە میراتیان بۆ دیاری نەکراوە، کە تەنیا ئەوان بۆیان هەیە وەسیەتیان بۆ بکرێ، ئەویش لەسەر ڕای ئەوانە کە دەڵێن: فەرموودەکە ڕاستە، بەڵام ئەگەر فەرموودەکە ڕاست نەبێت، ئەوە ئەوکاتە بەو شێوەیەی کە تەفسیری دیکەمان بۆ ئایەتەکە کرد، دەگونجێ مەبەست ئەوەبێ، کە وەك چۆن ئەندازەیەك ماڵ بە میرات دیاریکراوە، بە وەسیەتیش ئەندازەیەك دیاری بکرێ، بۆ وێنە: ئەو کەسەی هەشت یەك دەگرێ، شەش یەك دەگرێ، سێیەك دەگرێ، بە وەسیەتیش ئەندازەیەکی دیکە بگرێ، کە ئەوکاتە میراتەکە بەخششی خوایەو ئەوەش کە بە وەسیەت دەیگاتێ بەخششی ئەو کەسەیە کە خەریکە دنیا بەجێ دەهێڵێ‌و کۆچی دوایی دەکات.

**مەسەلەی چوارەیەم:** زانایان لەسەر ئەوە یەك دەنگن، کە هەرکەسێك قەرزی لەسەربێ‌و ئەمانەت‌و سپاردەیەکی خەڵکی لەلابێ، لەسەری فەرزە وەسیەت بکات، بۆ ئەوەی قەرزەکان بدرێنەوەو ئەمانەتەکان بە شوێنی خۆیان بگەن، بەڵام بۆ غەیری ئەوەی کە قەرزدارەو بۆ غەیری ئەوەی کە ئەمانەتی لەلایە، ئایا وەسیەت کردن فەرزە یان سوننەتە، یان هەرسوننەتیش نیە؟ زانایان لەوبارەوە ڕاجیاییان هەیە:

زۆربەی زانایان دەڵێن: فەرزنیەو لە نێویشیاندا (مالك و شافعي و الثوري) هەن، هەندێکیش دەڵێن: لە هەموو حاڵاندا هەر فەرزە، ئەوانیش (الزهري و أبو إسحاق)یان لەنێودا هەن[1].

وە من بەڕاستی ئەو ڕایەم پێ بەهێزترە کە دەڵێ: وەسیەت هەر فەرزە، بەپێی ئەم بەڵگانە:

---

١) بڕوانە: سەرچاوەی پێشوو، ج: (٢)، ص: (٤٩٩، ٥٠٠).

یەکەم: خوا زۆر بەڕاشکاویی دەفەرموێ: ﴿ كُتِبَ عَلَيْكُمْ إِذَا حَضَرَ أَحَدَكُمُ ٱلْمَوْتُ إِن تَرَكَ خَيْرًا ٱلْوَصِيَّةُ ﴾، لەسەرتان پێویست کراوە (كُتِبَ) واتە: (فُرِضَ) واتە: لەسەرتان پێویست کراوە، ئەم وشەیەش بۆمان نیە لەخۆڕا بڵێین: مەبەست پێی (ندب)ە، مەگەر نیشانەیەك (قرينة)یەك هەبێت ناچارمان بکات، کە لێرەشدا هیچ نیشانە (قرينة)ی وا نیە.

دووەم: ئێمە فەرموودەی (صحيح) ڕاستو دروستی پێغەمبەرمان هەیە ﷺ کە فەرموویەتی: {(مَا حَقُّ امْرِئٍ مُسْلِمٍ، لَهُ شَيْءٌ يُوصِيَ فِيهِ، يَبِيتُ لَيْلَتَيْنِ إِلاَّ وَوَصِيَّتُهُ مَكْتُوبَةٌ عِنْدَهُ) (رَوَاهُ الْبُخَارِيُّ برقم: (٢٧٣٨)، وَمُسْلِم برقم: (٤١٨٣)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٢٨٦٢)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٩٧٤)، وَالنَّسَائِيُّ برقم: (٣٦٢١)، عَنْ إِبْنُ عُمَرَ رضي الله عنه}، واتە: هەقی هیچ مسوڵمانێك نیە، شتێکی هەبێ (ماڵو سامانێکی هەبێ) کە بەکەڵکی ئەوە بێت وەسیەتی تێدا بکات، دوو شەوان لەسەریەك بمێنێتەوەو وەسیەتەکەی بەنووسراوی لەلا نەبێ، واتە لەسەری پێویستە وەسیەت بنووسێ مادام پارەو سامانێکی هەبێ کە لێی بەجێ بمێنێ، هەر ئینسانێکی مسوڵمان لەسەری پێویستە وەسیەت بنووسێ، وە دوو شەو نەمێنێتەوە، بەبێ ئەوەی کە وەسیەتەکەی نووسیبێ، ئەوە مانای وایە ئەم فەرموودە پشتگیریی ئایەتەکە دەکات کە وەسیەتکردن فەرزە، مادام ئەو کەسە پارەو سامانێکی وای هەبێ شایستەی وەسیەت تێداکردن بێ، ئەگەرنا دیارە (بسم الله) لە سفرەی خاڵیی ناکرێ !.

**مەسەلەی پازدەیەم:** ئایا ئەو ئەندازەیەی وەسیەتی تێدا دەکرێت (واتە: دروستە بکرێتە وەسیەت) چەندە؟ وە ئایا مرۆڤ کە دەزانێ دەمرێو نەخۆشیی مەرگی گرتووە، بۆی هەیە بڵێ: هەموو ماڵەکەی خۆم دەکەمە وەسیەت؟ زۆربەی هەرە زۆری زانایان ئەگەر نەڵێین هەموویان، دەڵێن: ئەندازەی وەسیەت نابێ لە سێیەکی (٣/١)ی ماڵ زیاتربێ، ئەویش بۆچی؟

ئەم فەرموودەیە ئەوەی ڕوونکردۆتەوە کە بوخاریی‌و موسلیم لە سەعدی کوڕی ئەبی وەققاص گێڕاویانەتەوە خوا لە هەموویان ڕازی بێ: {(عَن عَامِرِ بنِ سَعدٍ، عَن أَبِيهِ ﷺ قَالَ: جَاءَنا رَسولُ اللهِ ﷺ يَعُودُني عَامَ حَجَّةِ الوَدَاعِ، مِن وَجْعٍ اشتَدَّ بِي، فَقُلتُ: إِنِّي قَدْ بَلَغَ بِي مِنَ الوَجْعِ، وَأنا ذُو مَالٍ، وَلا يَرِثني إلاَّ ابْنَةٌ، أفأتَصَدَّقَ بِثُلُثَيْ مَالِي؟ قَالَ: "لا". فَقُلتُ: بالشَّطرِ؟ قَالَ: "لا" ثُمَّ قَالَ: الثُّلُثُ والثُّلُثُ كَبِيرٌ، أو كَثِيرٌ، إنَّكَ أن تَذَرَ وَرَثَتَكَ أَغنِيَاءَ، خَيرٌ مِن أَنْ تَذَرَهُم عالَةً يَتَكَفَّفونَ النَّاسَ) (رَوَاهُ البُخَارِيُّ بِرقم: (٥٦٦٨)، وَمُسْلِمٌ بِرقم: (٤١٨٥)، وَأَبُو دَاوُدَ بِرقم: (٢٨٦٤)، وَالتِّرمِذِيُّ بِرقم: (٢١١٦)، وَالنَّسَائِيُّ برقم: (٣٦٢٨)}، واتە: سەعدی کوڕی ئەبی وەققاص خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ: پێغەمبەری خوا لە حەجیماڵئاواییدا (واتە: ئەو حەجەی کە کردیو دوای ئەو حەجە، حەجی دیکەی نەکردو ماڵئاوایی لە دنیا کرد)، سەردانی کردم کاتێك کە من نەخۆش بوومو نەخۆشییەکی تووندم گرتبوو، گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئازارێکی زۆرم هەیە (وەك بڵێی لەخۆی ترسابێ بمرێ)، وە من ماڵو سامانی باشم هەیەو، تەنیا کچێکم هەیە میراتم لێ بگرێ، ئایا دوو لەسەر سێی (٣/٢)ی ماڵو سامانەکەم بکەمە وەسیەت؟ فەرمووی: نەخێر، گوتم: ئەدی نیوەی بکەمە وەسیەت؟ فەرمووی: نەخێر، بەڵکو سێیەك (٣/١)، سێیەکیش (٣/١) گەورەیە، یان فەرمووی: زۆرە (ئنجا حیکمەتەکەی بۆ ڕوون کردەوەو فەرمووی) تۆ ئەگەر میراتگرەکانی خۆت بە دەوڵەمەندیی بەجێ بهێڵی (واتە: میراتێکی باشیان پێببڕێ) باشترە، وەك لەوەی هەژارو نەداربنو دەست لەبەر خەڵکی پانبکەنەوە، (واتە: ئەوەت خێرترە نەك بیکەی بە وەسیەت، بەڵکو با میراتەکەت لێ بگیرێ، خزمەکانت پێویستیان پێیەتی با وەریبگرن نەك خەڵکی دی، ئا ئەوەیانت خێرترە) لەم فەرمایشتەوە زانایان هەڵیان هێنجاوە، کە لە سێیەك (٣/١) زیاتر دروست نیە، بکرێتە وەسیەت. بەڵکو عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس خوا لە خۆیو بابی ڕازی بێ، گوتوویەتی: مادام پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((الثُّلُثُ والثُّلُثُ كَبِيرٌ، أو كَثِيرٌ)) وا باشترە لە چوار یەك (٤/١) زیاتر نەکرێتە وەسیەت.

**مەسەلەی شازدەیەم:** حیکمەتی وەسیەت چییەو بۆچی خوا ﷻ وەسیەتی داناوە، کە دروستە پێش مەرگ ئینسان وەسیەت بکات، لە ماڵو سامانیدا، بۆ ئەوەی کە بیدات بە هەندێ کەس ؟!

**یەکەم:** پێغەمبەر ﷺ لە فەرموودەیەکدا فەرموویەتی: {(إِنَّ اللَّهَ تَصَدَّقَ عَلَيْكُم، عِنْدَ وَفَاتِكُمْ، بِثُلُثِ أَموَالِكُمْ، زِيَادَةً لَكُمْ فِي أَعْمَالِكُمْ) (رَوَاهُ ابن ماجه برقم: (٢٧٠٩)، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، وَحَسَّنَهُ الأَلبانِي}، واتە: بێگومان خوا خێری پێکردوون کە سێیەکی (٣/١)ی ماڵتان ببەخشن بۆ ئەوەی ببێتە زیادە بۆ کردەوەکانی دیکەتان کە کردووتانن، (ئێستاش کە کاتی سەرەمەرگتانە، بۆتان هەیە سێیەکی (٣/١)ی ماڵەکەتان ببەخشن).

**دووەم:** حیکمەتێکی دیکەی ئەوەیە کە جاری وا هەیە، ئەگەر بە هۆی وەسیەتەوە نەبێ، بەهۆی میراتەوە هەندێ کەس لە خزمانی نزیکی ئەو کەسەی کە خەریکە بمرێ، بێبەش دەبن، با چەند حاڵەتێك لەوبارەوە بە نموونە بێنینەوە:

١/ پیاوێکی مسوڵمان خێزانێکی کافری هەیە جوولەکەیە، یان نەصرانییەو میراتی لێ ناگرێ، مانای وایە ئەگەر وەسیەتی بۆ بکات، ئەندازەیەك لە ماڵەکەی سێیەکی (٣/١)ی یان ئەندازەیەکی کەمتری ماڵەکەی بداتێ، ئەوە شتێکی باشە، ئەگەرنا وەك میرات بێبەش دەبێ.

٢/ ئنجا حاڵەتێکی دی هەیە، کەسێك بمرێو کچی برای یاخود کچی خوشکی لێبەجێ بمێنێ، وە مامیشی یاخود کوڕە مامیشی لەپاش بەجێ بمێنێ، ئەوە هەم مامەکەو هەم کوڕە مامەکەش، ئەگەر مام نەبێ، هەردوو کچەکان، هەم کچی برایەکەیو هەم کچی خوشکەکەی بێبەش دەکەن، چونکە مامو کوڕەکەی (عَصَبة)نو ئەوانیش، واتە: کچەکان، (ذووا الأَرْحَام)نو، (عَصَبة)ش (حَجْب)ی (ذو الأَرْحَام) دەکەن، واتە: بێبەشیان دەکەن، ئەوە بنچینەیەکی میراتییە.

٣/ ئنجا حاڵەتێکی دی هەیە کە کەسێك دەمرێ، کوڕێکی برای یاخود کچێکی برای لەپاش بەجێدەمێنێ، لەو حاڵەتەدا میراتەکە هەمووی دەبێتە هی کوڕە

برایەکەی‌و، کچە برایەکەی هیچ میرات نابات، بۆچی؟ چونکە کوڕە برایەکە (عَصَبة)یە کچەکە (ذووا الأَرْحَام)ە، لەو حاڵەتەشدا بەهۆی وەسیەتەوە بۆ ئەوانە، دەگونجێ قەرەبوو بکرێنەوە، کەواتە: حیکمەتی وەسیەت ئەوەیە، کە ئەوانەی بەهۆی میراتەوە شتێکیان پێ نابڕێ، بە هۆی وەسیەتەوە بۆیان قەرەبوو بکرێتەوە.

**مەسەلەی حەفتەیەم:** ئایا دروستە وەسیەت بۆ بێگانە بکرێ، کاتێ کە خزم هەبن؟ زانایان لەوبارەوە ڕاجیاییان هەیە[1]:

١- زۆربەی زانایان کە (أبو حنيفة و مالك و شافعي و أحمد و أوزاعي)یان لەنێودا هەن دەڵێن: دروستە، واتە: مرۆڤ وەسیەت بکات بۆ بێگانە ئەندازەیەك لە ماڵەکەی بدرێتێ کە لە سێیەك زیاتر نەبێ، بەڵام شتێکی خراپی کردوە.

٢- بەڵام (طاوس والحسن البصري) دەڵێن: دروست نیەو، دەبێ ئەو وەسیەتە هەڵبوەشێنرێتەوە.

**مەسەلەی هەژدەیەم:** کەسێك کە نەخۆشیی مەرگ (مَرَض الـمَوْت)ی گرتوە، ڕێگەی لێدەگیرێ کە تەصەڕڕوف لە ماڵەکەیدا بکات یان نا ؟ واتە: نەك هەروەك سێیەك (٣/١) بەڵکو بیەوێ هەر هەموو ماڵەکەی تەخشان‌و پەخشان بکات، کە دەشزانێ نەخۆشی مەرگی گرتوە[2]؟

١) هەموو زانایان دەڵێن: بەڵێ ڕێی لێدەگیرێ، چونکە کە نەخۆشیی مەرگی گرت، مانای وایە دەبێ وەسیەت بکات، وەسیەتیش دەبێ تەنیا لە سێیەکی (٣/١)ی ماڵدا بێ، بەڵام ئەگەر بیەوێ هەموو ماڵەکەی ببەخشێ، مانای وایە لەو ئەندازەیەی کە شەرع بۆی دیاری کردوە، زیاتر پێ ڕادەکێشێ، بۆیە دەبێ ڕێی لێ بگیرێ.

٢) بەڵام (ظاهري)یەکان دەڵێن: نەخێر هەقی خۆیەتی‌و هەتا گیانی لەبەردابێ، بۆی هەیە تەصەڕڕوف لە ماڵی خۆیدا بکات، بەڵام دیارە ڕای

---

١) هەمان سەرچاوەو بەرگ، ص : (٥٠٢، ٥٠٣).

٢) هەمان سەرچاوەو بەرگ، ص : (٥٠٣).

زۆربەی زانایان ڕاستو بەجێیەو لە عەقڵی سەلیم فەرموودەکەی پێغەمبەریش ﷺ کە پێشتر هێنامان لە (عامر بن سعد بن أبي وقّاص)ەوە، خوا لێیان رازی بێو (بخاري و مسلم وأبو داود و ترمذي و نسائي) هێناویانەو پێغەمبەر ﷺ تێیدا ڕێ لە (سعد) دەگرێ کە لە سێیەکی ماڵەکەی زیاتر بکاتە وەصیەت، باشترین بەڵگەیە لەوبارەوە.

**مەسەلەی نۆزدەیەم:** زۆربەی زانایان بە دروستیان داناوە دوای ئەوەی میراتلێگیراو (مُورِّث) مۆڵەت لە میراتگران وەردەگرێ، کە وەسیەت لە ئەندازەی سێیەك (٣/١) زیاتر دا بکرێ، واتە: کەسێك کەوتۆتە حاڵەتی نەخۆشیی مردنەوەو میراتگرەکان کۆدەکاتەوەو مۆڵەت (إجازة)یان لێوەردەگرێ، کە زیاتر لە سێیەکی ماڵەکەی بکاتە وەسیەت، ئەگەر ئیجازەیاندا، زۆربەی زانایان دەڵێن دروستە، بەڵام ظاهیرییەکان دەڵێن دروست نیەو ڕای زۆربەش ڕاستترە[1].

**مەسەلەی بیستەم:** ئایا ئەگەر کەسێك وەسیەتێکی کرد بە شتێکی ناشەرعیو نادروست جێبەجێ دەکرێ؟ بۆ وێنە: وەسیەتی کرد بە دروستکردنی مەیخانەیەك، یاخود کڕینی شەراب، یاخود فڵانە ناشەرعیی بکەن، یان فڵانە کەس بکوژن ...؟ لەوەدا هیچ کام لە زانایان ڕاجیاییان نیە، کە وەسیەت لە شتی حەرامدا جێبەجێ ناکرێ[2].

**مەسەلەی بیستو یەکەم:** گۆڕینی وەسیەت چۆنە؟ کە دەفەرموێ: ﴿ فَمَنۢ بَدَّلَهُۥ بَعۡدَ مَا سَمِعَهُۥ فَإِنَّمَآ إِثۡمُهُۥ عَلَى ٱلَّذِينَ يُبَدِّلُونَهُۥٓۚ إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٞ ﴾، وە وەسیەت گۆڕین دەگونجێ مەبەست پێی ئەو کەسەبێ کە شایەدەو گوێی لە کابرای وەسیەتکەرە، دوایی وەسیەتەکە دەگۆڕێ، یاخود دوو شایەد پێیان گوتوە: کە ئاوا وەسیەتی کردوە، کەچی دەیگۆڕێ، دەشگونجێ مەبەست پێی خودی وەسیەتکەرەکە بێ، کە ئەو حوکمە شەرعییە دەگۆڕێ کە شەریعەت دایناوەو سێیەك (٣/١)

---

١) هەمان سەرچاوەو بەرگ، ص: (٥٠٣).

٢) سەرچاوەی پێشوو، ص: (٥٠٦).

زیاتر دەکاتە وەسیەت، یاخود شەریعەت دایناوە ماڵەکەی بۆ میراتگران بێت، کەچی دەیگۆڕێ، دەگونجێ مەبەست پێ هەرکامێکیان بێت[١].

**مەسەلەی بیست‌و دووەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ فَمَنْ خَافَ مِن مُّوصٍ جَنَفًا أَوْ إِثْمًا فَأَصْلَحَ بَيْنَهُمْ فَلَآ إِثْمَ عَلَيْهِ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ لَعَلَّكُمْ لَعَلَّكُمْ رَّحِيمٌ ﴾، هەر کەسێك مەترسیی هەبوو لە کابرای وەسیەتکەر کە بەهەڵەدا بچێ، یاخود بە گوناهباریی بە شێوەیەك وەسیەت بکات شەرعیی نەبێ، بۆی هەیە چاکسازیی بکات لەنێوانیانداو نەهێڵێ وەسیەتکەر تووشی لادان بێ، وە ئەوە فەرزی کیفایەیە لەسەر کۆمەڵگاو دەوڵەتی ئیسلامیی‌و بە کەمتەرخەمیی تێداکردنی هەموویان گوناهبار دەبن‌و ئەگەر یەکێك یان زیاتریشیان پێی هەڵسان بەرپرسیارێتی‌و گوناه لەسەر هەموویان لادەچێ، وەك هەر فەرزێکی دیکەی گشتی .

**مەسەلەی بیست‌و سێیەم:** ئەم ڕستە قورئانییە ﴿ فَمَنْ خَافَ مِن مُّوصٍ جَنَفًا أَوْ إِثْمًا فَأَصْلَحَ بَيْنَهُمْ فَلَآ إِثْمَ عَلَيْهِ ... ﴾، بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە دروستە ئینسان جاری وا هەیە با نەگەیشتبێتە یەقینیش، بە گومان ئیش بکا، چونکە دەفەرموێ: کەسێك کە مەترسیی هەیە، واتە: لەلای نەبووە بە عیلم‌و یەقین، بەڵام گومانی هەیە لەو حاڵەتەدا بۆی هەیە دەستی وەسیەتکەر بگرێ‌و بکەوێتە بەین، بۆ ئەوەی نەهێڵێ وەسیەتێك بکرێ کە لەجێی خۆیدا نەبێ[٢].

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

---

١) هەمان سەرچاوەو بەرگ، ص: (٥٠٧).

٢) هەمان سەرچاوەو بەرگ‌و لاپەڕە.

# دەرسی سی و حەوتەمین

## پێناسـەی ئەم دەرسـە

ئەم دەرسـەمان لە ئایەتی ژمارە (١٨٣ تاكو ١٨٥) لـە سـوورەتی (البقـرة) دەگرێتـە خۆی، لەو سێ ئایەتـەدا خوا ﷻ بۆ جاری پێنجەم ڕوو لە ئیمانداران دەكاتو پێیان ڕادەگەیەنێ، كە ڕۆژووگرتنیان لەسـەر پێویست كراوە، وەك چۆن لەسەر ئۆممەتانی پێش ئەوان پێویست كراوە، دوایی باس دەكات، كە ئەگەر نەخۆش كەوتن یاخود لە سەفەر بوون، بۆیان هەیە بەڕۆژوو نـەبنو دوایـی بیگرنـەوە. پاشـان باسـی مـانگی ڕەمەزان دەكـات كە قورئانی تێـدا هاتۆتــە خـــوار، وە باسـی ئـەوە دەكـات خـوا ﷻ دەیەوێ دینداریتان بۆ ئاسان بكاتو نایەوێ لێتان بە زەحمەت بخـات.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُتِبَ عَلَيۡكُمُ ٱلصِّيَامُ كَمَا كُتِبَ عَلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تَتَّقُونَ ﴿١٨٣﴾ أَيَّامٗا مَّعۡدُودَٰتٖۚ فَمَن كَانَ مِنكُم مَّرِيضًا أَوۡ عَلَىٰ سَفَرٖ فَعِدَّةٞ مِّنۡ أَيَّامٍ أُخَرَۚ وَعَلَى ٱلَّذِينَ يُطِيقُونَهُۥ فِدۡيَةٞ طَعَامُ مِسۡكِينٖۖ فَمَن تَطَوَّعَ خَيۡرٗا فَهُوَ خَيۡرٞ لَّهُۥۚ وَأَن تَصُومُواْ خَيۡرٞ لَّكُمۡۖ إِن كُنتُمۡ تَعۡلَمُونَ ﴿١٨٤﴾ شَهۡرُ رَمَضَانَ ٱلَّذِيٓ أُنزِلَ فِيهِ ٱلۡقُرۡءَانُ هُدٗى لِّلنَّاسِ وَبَيِّنَٰتٖ مِّنَ ٱلۡهُدَىٰ وَٱلۡفُرۡقَانِۚ فَمَن شَهِدَ مِنكُمُ ٱلشَّهۡرَ فَلۡيَصُمۡهُۖ وَمَن كَانَ مَرِيضًا أَوۡ عَلَىٰ سَفَرٖ فَعِدَّةٞ مِّنۡ أَيَّامٍ أُخَرَۗ يُرِيدُ ٱللَّهُ بِكُمُ ٱلۡيُسۡرَ وَلَا يُرِيدُ بِكُمُ ٱلۡعُسۡرَ وَلِتُكۡمِلُواْ ٱلۡعِدَّةَ وَلِتُكَبِّرُواْ ٱللَّهَ عَلَىٰ مَا هَدَىٰكُمۡ وَلَعَلَّكُمۡ تَشۡكُرُونَ ﴿١٨٥﴾ ﴾

## مانای وشە بە وشەی ئایەتەكان

((ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! ڕۆژووگرتنتان لەسەر پێویست كراوە، وەك چۆن لەسەر ئەوانەی پێش ئێوە پێویست كرابوو، بەڵكو پارێزكاریی بكەن ﴿١٨٣﴾ چەند ڕۆژێكی ژمێردراون، وە هەركەسێكتان نەخۆش بوو، یان لە سەفەربوو (وە بەڕۆژوو نەبوو) با ژمارەیەك لە ڕۆژانی دیكە بگرێتەوە، وە ئەوانەی كە زۆر بەزەحمەت بۆیان دەگیرێ، با فیدیە بدەن كە خواردنی نەدارێكە، وە هەركەسێكیش خۆبەخشانە چاكەی زیاد بكات، ئەوە بۆی باشترە، وە ئەگەر بزانن ڕۆژووگرتنتان چاكترە ﴿١٨٤﴾ ئەو مانگی ڕەمەزانەی كە قورئانی تێدا نێرراوەتە خوارێ، ڕێنمایی‌یە بۆ خەڵكی وە بە بەڵگەگەلی ڕوونی لە ڕێنمایی‌و جیاكەرەوە (ی هەق‌و ناهەق)ی تێدان، جا هەركامێكتان لەمیانەی ئەو مانگەدا (لە ماڵ) ئامادەبوو بابیگرێ. هەر كەسێكیش نەخۆش بوو، یان لە سەفەر بوو پاشان با ژمارەیەك لە ڕۆژانی دیكە بگرێتەوە، خوا ئاسانیی بۆتان دەوێ‌و نایەوێ سەغڵەتتان بكات، (وە ئەوەی گوترا بۆی ڕوونكردنەوە) تاكو ژمارەكە تەواو بكەن‌و (واتە: ژمارەی ڕۆژەكانی مانگی ڕەمەزان) وە بۆ ئەوەی خوا بە گەورە بگرن لەسەر ئەوە كە ڕێنمایی كردوون، وە تاكو سوپاسگوزاریی بكەن ﴿١٨٥﴾)).

## شیكردنەوەی هەندێك لە وشەكان

(اَلصِّيَامُ): واتە: ڕۆژووگرتن. (الصَّوْمُ في الأَصْلِ: الإمْسَاكُ عَنِ الفعْلِ مَطْعَمَاً كَانَ، أو كَلاَمَاً، أو مَشْياً) وشەی: (صَوْم) لە بنەڕەتی زماندا بە مانای خۆگرتنەوە دێ لە هەر كردەوەیەك، خواردن بێ، یان قسەكردن بێ، یان ڕۆیشتن بێ، (والصَّوْمُ في الشَّرْعِ: إمْسَاكُ المُكَلَّفِ بالنِّيَّةِ مِنَ الخَيْطِ الأَبيَضِ إلى الخَيْطِ الأَسودِ عَنِ المَفطِراتِ)، واتە: ڕۆژووگرتن لە زاراوەی شەرعدا بریتیە لەوە كە ئینسانێك كە تەكلیفی شەرعیی كەوتۆتە سەر، بە

نیەتـەوە لـە دەزووی سـپی بەرەبـەیان هەتاكـو دەزووی ڕەشـی ئێـوارە، خـۆی بگرێتەوە لە هەموو ئەوانەی کە ڕۆژوو دەشکێنن، وەك: (خواردن‌و خواردنەوەو جووتبوونی ژن‌و مێرد).

(لَعَلَّكُمْ): (لَعَـلَّ: طَمَـعَ وَ إشفَـاقُ، وَقيـلَ (لَعَـلَّ) مِـنَ اللهِ وَاجِـبٌ، وَفُسـر فـي كَثِـير مِـنَ الـمَوَاضِع بِـ كَـي) وشـەی (لَعَـلَّ) لـە زمـانی عەرەبیـدا، واتـە: ئومێـد وەبەرنان‌و سۆز نواندن، وە لە زۆر شوێناندا وشـەی (لَعَـلَّ) بـە (كَـي)، واتـە: (تاكو) تەفسیـر كراوەو لێكدراوەتەوە هەندێكیش دەڵێن: خوا ﷻ كە وشـەی (لَعَـلَّ)ی بۆخـۆی بەكارهێنـاوە، واتـە: ئەوشتەی لەسـەر خـۆی واجب كـردوە، چونكە دەڵـێ: (مِـنْ عَـادَةِ كَـرِيمِ إذَا أَطْـمَعَ أَعْطَـى) واتـە: عـادەتی بەخشـندە ئەوەیـە، كە ئەگەر كەسێكی تەمادار كرد، پێشی بدات.

(مَّعْـدُودَاتٍ): واتە: (محصیات) ژمێردراوەكان، كۆی (معدود)ە، واتـە: ژمێـردراو، كـەم، چونكە شتی كەم دەژمێردرێ (العِدَّةُ: الشَّـيءِ الـمَعدُود) شتی ژمێـردراو، واتـە: ڕۆژانێكـی كـەم كـە دەژمێـردرێن، كـە مەبەسـت پێیـان سـی (٣٠) ڕۆژەی مانگی ڕەمەزانـە.

(مَّرِيضًـا): (الـمَرَضُ: الخَرُوجُ عَنِ الإعْتِـدَالِ جِسْمَاً أو رُوحَـاً)، (مَـرَض) بریتیـە لـە تێكـچوونی حاڵـەتی ئاسـایی ئینـسان، لـەڕووی جەسـتەیی یـاخود لـەڕووی دەروونییەوە.

(سَفَـرٍ): واتە: چوونە دەرێی ئینسان لە ماڵ، كە ئەویش زانایان زۆر مشت‌ومڕیـان لەوبارەوە كـردوە، كـە ئایـا سـەفەر ئەندازەكـەی چـەندەو چۆنە ؟ وە من ئـەو ڕایـەم پـێ پەسـندە كـە موتڵـەقی لـە مـاڵ دەرچـوون، بەنیـەتی سـەفەر، پێـی دەگوترێ سەفەر، واتە: ئەوەی كە لە عورفی خەڵكدا بە سەفەر ناو دەبرێ‌و، لە شەرعیشدا پێی دەگوترێ سـەفەر، چونكە زانایان لەسـەر ئـەوە یەكدەنگن كـە هەموو ئەو وشەو زاراوانەی شەرع نیۆرۆكی بۆ دیاری نـەكردوون، مانایەكـەیان

دەگەڕێتەوە بۆ زمانو عورفو باوی خەڵكو، خەڵك ئەو وشەیان بۆچی بەكارهێنابوو، لە شەرعیشدا دیارە هەمان مەبەستی تێدا ڕەچاوكراوە.

(يُطِيقُونَهُ): (أَصْلُ الطَّوْقِ: مَا يُجْعَلُ فِي العُنُقِ خِلْقَةً أو صُنعَةً، والطَّاقَةُ: إِسْمٌ لِمقْدَارِ مَا يُمكِنُ لِلإنسانِ أن يَفعَلُهُ بِمَشَقَّةٍ وذَلِكَ تَشْبِيه بالطَّوْقِ)، (طَوْق): بریتیە لە هەرشتێك كە لە گەردن دەكرێ، جا چ خوای پەروەردگار ئەوەی تێدا كردبێ، وەك كۆترو كەو كە خەتو نەخشیان لە ملدا هەن، (أَوْ صُنْعَةً) یاخود دروستكراوبێ، وەك ملوانكە كە ئافرەت لە گەردنی دەكات، یان پەتێك كە لە ملی كەسێك دەكرێ، وە (طَاقَة) بریتیە لەو ئەندازەیەی كە ئینسان دەتوانێ كارێكی پێبكات، بەڵام زۆر بەزەحمەت، لە (طَوْق)ەوە هاتوە، وەك ئەوەی ئەو شتە تەواو لێی وێك هاتبێتەوە، وەك چۆن گەردن بەندێك یان پەتێك كە دەخرێتە ملی ئینسان، لە هەموو لایان ڕا لێی وێك دێتەوەو تەواو فزەی لێ بڕیوە.

(فِدْيَةٌ): (الفِديَةُ: مَا يَقي بِهِ الإنسَان نَفْسَهُ مِنْ مَالٍ يَبذلُه فِي عِبَادَةٍ وَقَصَّر فِيهَا)، (فِديَة): بریتیە لەو ئەندازەماڵەی كە ئینسان دەیبەخشێ بۆ ئەوەی كە خۆی پێ بپارێزێ لە سزای خوا، لە خواپەرستییەكدا كەمتەرخەمیی تێدا كردوە.

(تَطَوَّعَ): (الطَّوْعُ: الإنقيَادُ وَيُضَادُّهُ الكُرْهُ)، (طَوع): بریتیە لە ملكەچیەكی بە خۆشحاڵییەوە، پێچەوانەی (كُرْه): كە بریتیە لە ملكەچیەكی بە ناخۆشحاڵیی، وەك خوای زاڵی دەفەرموێ: ﴿ثُمَّ ٱسْتَوَىٰٓ إِلَى ٱلسَّمَآءِ وَهِىَ دُخَانٌ فَقَالَ لَهَا وَلِلْأَرْضِ ٱئْتِيَا طَوْعًا أَوْ كَرْهًا ...﴿١١﴾﴾ فصلت، ئنجا ویستی ئاسمان دروست بكات، جا بە ئاسمانەكانو زەوی فەرموو: بە خۆشحاڵیی دروست بن یاخود بە ناخۆشحاڵیی، (واتە: ئەگەر بە خۆشحاڵیی دروست نابن بە ناخۆشحاڵیی هەردەبێ دروست بن) كە لێرەدا مەبەست پێی ئەوەیە ئیرادەو

ویستی خوا ئەوەندە زاڵە بەسەر مەخلووقاتیدا، کە هیچ کەس‌و هیچ شتێك ناتوانێ لە فەرمانی خوا دەرچێ، پێی خۆشبێ یان پێی ناخۆشبێ (وَالتَطَوّعُ: تكَلُّفُ الطَاعَةِ)، (تَطَوّع): بریتیە لەوە کە ئینسان فەرمانبەرییەك بۆ خوا ئەنجامبدات‌و زەحمەت لەخۆی بکات، (وَهُوَ فِي التَعَارف التَبَرُّعُ بِمَا لاَ يَلْزَمُ كَالتنفُل)، وە لە زاراوەی شەرعدا (تطوع): بریتیە لەوە کە ئینسان خۆبەخشیی بکات‌و شتێك ئەنجامدا کە لەسەری پێویست نەبێت ﴿ فَمَن تَطَوَّعَ خَيْرًا ﴾، واتە: هەرکەسێك چاکەیەکی کرد بەبێ ئەوەی لەسەری پێویست بێت، ﴿ فَهُوَ خَيْرٌ لَّهُۥ ﴾، ئەوە بۆ ئەو چاکترە، واتە: پاداشتی زیاتری هەیە.

(ٱلشَّهۡرَ): واتە: مانگ نەك مانگ بەمانای (قَمَر)، واتە: ئەو ماوەیە لە کات کە بە (٢٩) شەو یاخود (٣٠) شەو، ئەگەر مانگی قەمەریی بێ، یاخود بە (٣٠) یان (٣١) ڕۆژ تەواو دەبێ، ئەگەر مانگی خۆریی بێ، (الشهرُ: مُدَّةُ مَشهورَةُ بإهلالِ الهلال)، (شهر) ماوەیەکی زانراوە لەو کاتەوە کە مانگی یەك شەوە دێت‌و خەڵك دەنگ بەرزدەکەنەوەو دەڵێن: ئەوە (هلال)ە، لەو کاتەوە دەست پێدەکات، تاکو مانگ بەرزدەبێتەوە، کە مانگ (٢٩) شەو یاخود (٣٠) شەوی پێدەچێ، وە ئەگەر مانگی خۆریی مەبەست بێ بریتیە لە بەشێك لە دوازدە بەشی سووڕانەوەی زەوی بە دەوری خۆردا، لە خاڵێکەوە بۆ هەمان خاڵ، کە لەوێوە دەستی پێکردوە.

(شَهِدَ): (الشهودُ: الحضُورُ مَعَ المُشاهَدَة، إمَا بالبَصَرِ، أو بالبَصِيرَةِ)، (شهود): بریتیە لە ئامادەبوون لەگەڵ بینیندا، چ بە چاو بینین، چ بە عەقڵ، کەواتە (شهدَ) واتە: ئامادەبوون، کە لە زۆر لە تەفسیرە کوردییەکاندا، ئەو وشەیان بەهەڵە تەفسیر کردوە، دەڵێن: (شهدَ) واتە: مانگی بینی، بەڵام (شهدَ) لێرەدا بەمانای بینینی مانگ نیە، بەڵکو واتە: ئامادەبوو (حَضَرَ)

﴿ فَمَن شَهِدَ مِنكُمُ ٱلشَّهۡرَ ﴾، ئەگەر فەرمووبای: (شَهِدَ القَمَر) ماناکەی: مانگی بینی، دەبوو، بەڵام بێگومان مانگ بە مانای: ماوەیەك لە کات نابینرێ، ئایا ماوەی زەمەنیی دەبینرێ؟ نابینرێ، بەڵام ئینسان تێیدا ئامادە دەبێت، کەواتە کە دەفەرموێ: ﴿ فَمَن شَهِدَ مِنكُمُ ٱلشَّهۡرَ ﴾، واتە: هەرکەسێك لە ئێوە لەو مانگی ڕەمەزانەدا لە ماڵی خۆی بوو، ئامادەبوو ﴿ فَلۡيَصُمۡهُ ﴾، ئەوە لەسەریەتی بەڕۆژوو بێت.

(رَمَضَانَ ): لە (رَمْض)ەوە هاتوە، (الرَمْض: أي شِدَّةُ وَقعِ الشَّمْسِ) تیشکی خۆر کە لە شتێك دەداو گەرمی دادێنێ، دەگوترێ: (رَمَض)، وە دەگوترێ: (أَرْمَضْتَهُ فَرُمِضَ) گەرمم داهێناو گەرم داهات، بۆیە مانگی ڕەمەزان ئەو ناوەی لێنراوە، چونکە مرۆڤ کە بەڕۆژوو دەبێ، هەناوی گەرم دەبێو تینی گەرمایی دەگاتە هەناوی، لەبەر تینووایەتی.

(ٱلۡيُسۡرَ ): (اليُسر ضِدُ العُسر) (وتَيَسر واستيسر، أي: تسَهَّلَ وَتَهَيَأ، وَاليُسر: السَّهْلُ)، واتە: (يُسر) پێچەوانەی (عُسر)ە، کەواتە (يُسر) واتە: ئاسانیو (عُسر) واتە: بەزەحمەتو قورس، دەگوترێ: (تيسر واستيسر) هەردووکیان بە مانای ئاسان بوو، ئامادەبوو، دێن.

(ٱلۡعُسۡرَ ): پێچەوانەی (يُسر)ە، واتە: زەحمەتو قورس، شتێك کە بە زەحمەت بکرێو قورس بێ، (والعُسرةُ عَدَم تَيسر وُجُود المَالِ) ئەوەیە کە کابرا ماڵو سامانی بە زەحمەت بۆ پەیدابێ ﴿ وَإِن كَانَ ذُو عُسۡرَةٖ فَنَظِرَةٌ إِلَىٰ مَيۡسَرَةٖ ... ﴿٢٨٠﴾ ﴾البقرة، واتە: ئەگەر بابای قەرزدار سەغڵەت بوو، ماڵی دەست نەدەکەوت چاوەڕێی بکەن، هەتا خوا دەروویەکی لێدەکاتەوە، (يَوْمَ العُسْرَة): واتە: ئەو ڕۆژەی کە تێیدا ئیش بەزەحمەت دەبێت.

## هـۆی هاتنە خـوارەوەی ئایەتەکـان

هـۆی هاتنـه خـوارەوەی ئـەو ڕسـتە کـە دەفـەرموێ: ﴿ وَعَلَى ٱلَّذِينَ يُطِيقُونَهُۥ فِدْيَةٌ طَعَامُ مِسْكِينٍ ﴾، واتە: لەسـەر ئەو کەسانەی بەزەحمەت پێیان دەگیـرێو دەبێ ئەوپەڕی توانای خۆیان بەخـەرج بدەن، ئەوجار بۆیان دەگیـرێ، بۆیان هەیـە کە فیدیە بدەن، خـواردنی نـەدارێك بـدەن {(أَخْرَجَ ابْنُ سَعْد فـي (طَبَقاتهِ) عَن مُجَاهِد هَذِهِ الآيَةَ نَزَلَت فـي مَوْلاَي قَيْسُ بْنُ السّائِبِ ﴿ وَعَلَى ٱلَّذِينَ يُطِيقُونَهُۥ فِدْيَةٌ طَعَامُ مِسْكِينٍ ﴾، فَأَفْطَرُ وَأَطْعَم لِكُلِّ يَوْمٍ مِسكِينًا)}، واتـە: ئـیبن سـەعد لە (طبقات)ی خۆیدا هێناویەتی لە موجاهیدەوە {موجاهید قوتـابی عەبدوڵـڵای کوڕی عەبباسـە خوا لـێی ڕازی بێ، واتە: لـە زانایـانی (تابعـین)ە} کـە گوتوویـەتی: ئـەم ئایەتـە لـەبارەی (قَيْسُ بْنُ السّائِبِ)ی مـەولام هاتـە خـوار: ﴿ وَعَلَى ٱلَّذِينَ يُطِيقُونَهُۥ فِدْيَةٌ طَعَامُ مِسْكِينٍ ﴾، کـە ڕۆژووەکـانی ڕەمـەزانی نەگـرتو لەجیـاتی هـەر ڕۆژێـك نـانی نەدارێکـدا، دیـارە (موجاهیـد) سـەییدێکی هەبووە کـە ئـازادی کردوە، چونکە وشەی: (مولى) لە زمانی عەرەبیدا هەم بەمانای (مُعْتِق) دێ، واتە: ئازادکـەر، هـەم بـە مانـای (مُعْتَقْ) دێ، واتـە: ئازادکـراو، جـا دیـارە (قَيْسُ بْنُ السّائِبِ) هـاوەڵ (صـحابي)ە، خـوا لـێی ڕازی بـێ، وە ئـەم ئایەتـە دەربـارەی وی هاتۆتە خـوار، کە مـەولای موجاهیـد، {واتـە: سـەیدی} بـووەو موجاهیـد وەختـی خـۆی کۆیلـەی ئـەو بـووەو ئـازادی کـردوە، دیـارە تەمـەنی زۆر بـووە، وە بـەڕۆژوو نەبووەو لە ڕەمەزانـدا ڕۆژووی نەگرتووە، وە لـەجیاتی هـەر ڕۆژێـك خـواردنی داوە بە نەدارێـك، واتە: ژەمە خواردنێك.

## مانــای گشــتی ئایەتەکــان

خوا ﷻ بۆ جاری پێنجەم لەم سوورەتە موبارەکەی (البقرة)دا، ڕوو لە کۆمەڵی ئیمانــدارو کۆمەڵگــای ئیمانــدار دەکــات، وە بــە نازنــاوێك کــە زۆر لەلایــان خۆشەویستە دەیاندوێنێ، کە بریتیە لە نازناوی ئیمان‌و دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ ﴾، ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! ئەگەر تێبینیتان کردبێ تا ئێستا ئەم (٥) پێنج جارە، کە خوا فەرموویەتی: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ ﴾، هەر جارە خوای کاربەجێ شتێکی گەورەو گرنگی بە ئیمانداران ڕاگەیاندوە، بۆیە بە ناوی: ئیمانداران بانگی کردوون بەو ناوونیشانە بەرزە دواندوونی، ئەگەر تەماشای هەموو شوێنەکان بکەینەوە، ئەوە زۆر ڕۆشن‌و ئاشکرایە، جا یەکێك لەو شتانەی کە لە پایەکانی کەسایەتی مسوڵمانان دادەنرێت، بریتیە لە ڕۆژووگرتنی مانگی ڕەمەزان، بۆیە خوا ﷻ لێرەدا ئیمانداران ئاگادار دەکاتەوە: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُتِبَ عَلَيۡكُمُ ٱلصِّيَامُ كَمَا كُتِبَ عَلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تَتَّقُونَ ﴾، ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە ! ڕۆژووگرتنتان لەسەر پێویست کراوە، وەك چۆن لەسەر ئەوانەی پێش ئێوە پێویست کرابوو، بۆ ئەوەی خۆتان بپارێزن، یاخود بۆ ئەوەی ببنە پارێزکارو تەقواتان پەیدابێ.

لەم ئایەتە وەردەگیرێ کە هەموو ئەو گەل‌و کۆمەڵانەی لە پێش پێغەمبەری ئیسلام ﷺ (موحەممەد)دا بوون‌و، پێغەمبەرانیان لەنێودا ڕەوانەکراون‌و، کتێبیان بۆ هاتۆتە خوار، لە شەریعەتی هەموویاندا ڕۆژووگرتن هەبووە، ئەم ئایەتە وای لێوەردەگیرێ، چونکە بەگشتی فەرموویەتی: ﴿كَمَا كُتِبَ عَلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِكُمۡ ﴾، کەواتە: دەتوانین بڵێین: هیچ شەریعەتێك نەبووە کە ڕۆژووگرتنی تێدا نەبێ، هەروەك هیچ شەریعەتێکیش نەبووە نوێژکردنی تێدا نەبێ، ئنجا

حیكمەتەكەشی بەیان دەكات ﴿لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ﴾، بۆ ئەوەی كە خۆتان بپارێزن، وشەی: (تقوى) یانی: پارێزكاریی، جا ئەوە زۆر شتی لێوەردەگیرێ، واتە: خۆتان بپارێزن لە سزای خوا، چونكە خوا ﷻ كەسێك فەرمانەكانی جێبەجێ نەكات سزای دەدا، یاخود خۆتان بپارێزن لەو دەردو نەخۆشییانەی بەهۆی زۆرخۆریی‌و بەردەوامیی لەسەر خواردن‌و خواردنەوەو زێدەڕۆیی تێداكردنیانەوە، پەیدا دەبن، یاخود بۆ ئەوەی خۆتان بپارێزن لە گوناح‌و تاوان، چونكە ئینسانی ڕۆژووگر بەرگریی (مَنَاعَة)ی دژی گوناحی تێدا دەبێ، یاخود خۆتان بپارێزن لە ڕەوشت‌و هەڵسوكەوتی ناشیرین، چونكە ئینسانی ڕۆژووگر سەیتەرەو كۆنترۆلی بەقوەتتر دەبێ بەسەر خۆیدا، كە تووشی غەڵەت‌و كەم‌و كوڕیی نەبێ، بە پێچەوانەی ئەوەوە كە لەنێو مسوڵماناندا باوە كە یەكێك بەڕۆژوو دەبێ، دەڵێن: لێی گەڕێن بەڕۆژوویە زوو تووڕە دەبێ ! كە ئەسڵی خۆی ڕۆژوو بۆ ئەوەیە مرۆڤ تووڕە نەبێ، نەك بە بیانووی ڕۆژووگرتنەوە، وەك فیشەكە شێتە بتەقێ، یان وەك شیر هەڵچێ‌و لەگەڵ خەڵكدا ڕووبەڕوو بێتەوە!! بەڵێ ڕۆژووگرتن بۆ ئەوەیە كە ئینسان ئەخلاق‌و ڕەوشتی جوان بێ، جا شتێك كە بۆیە دانراوە ئینسان ئەخلاق‌و ڕەوشتی پێی جوان بێ، بیكاتە بیانووی تێكدانی ڕەوشت‌و هەڵسوكەوتی خۆی، ئەوە بەڕاستی شتێكی خراپە، هەروەك ڕۆژووگرتن بۆ ئەوەیە كە ئینسان نەفس‌و ڕووحی سەیتەرە بكات بەسەرجەستەیدا، بەڵام زۆر كەس مانگی ڕەمەزان دەكاتە مانگی خواردنی خۆش‌و ڕابواردنی خۆش‌و سفرەو خوان ڕازاندنەوە !! كە بەڕاستی ئەوەش هەڵەیە، چونكە ئێمە ژەمێك دەپەڕێنین نیوەڕۆ نان ناخۆین، جا ئەگەر هاتو بەربانگ‌و پارشێوان هێندەت خوارد كە هی نیوەڕۆ بەزیادەوە قەرەبووی بكەیەوە، مانای وایە بەڕۆژوو نەبی چاكترە لەڕووی جەستەییەوە، چونكە لایەنی كەم، خواردنەكانت دابەش دەكرد، بەڵام ئەوەی كە دەبوو نیوەڕۆیان بیخۆی بەربانگ‌و پارشێوان بیخۆی خۆت ئەزیەت دەدەی، بۆیە زۆر كەس لە ڕەمەزاندا نەخۆش دەبێ، یاخود دوای ئەوەی كە ڕەمەزان تەواو دەبێ، جێژنان زۆر كەس نەخۆش دەبێ، لەبەر

ئەوە کە وەك خوا فەرموویەتی‌و وەك پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی بەو شێوەیە بەڕۆژوو نابن، ئنجا ڕوونی دەکاتەوەو دەفەرموێ: ﴿ أَيَّامًا مَّعْدُودَاتٍ ﴾، واتە: وا مەزانن ئەو ڕۆژانەش کە تێیاندا بەڕۆژوو دەبن، زۆرن، ڕۆژانێکی ژمێردراون‌و چەند ڕۆژێکی کەمن، سی (٣٠) ڕۆژە زۆر نیە، لە سێ سەدو شەست‌و پێنج (٣٦٥) ڕۆژ تۆ (٣٠) ڕۆژ بەڕۆژ دەبی‌و خۆت دەگریەوە، ئەویش نەك خۆگرتنەوەیەکی وابێ کە سەغڵەت بی، بەڵکو تەنیا چەند سەعاتێ خۆت دەگریەوە، ئنجا لەگەڵ ئەوەشدا کە ڕۆژەکان کەمن، وە ماوەی بەڕۆژووبوونەکەش کەمەو لە ڕۆژهەڵاتەوە تا ڕۆژئاوایە، ئنجا لەوێشدا خوا ﷻ دیسان میهرەبانیی‌و بەزەیی خۆی خستۆتە کار، دەفەرموێ: ﴿ فَمَن كَانَ مِنكُم مَّرِيضًا أَوْ عَلَىٰ سَفَرٍ فَعِدَّةٌ مِّنْ أَيَّامٍ أُخَرَ ﴾، لەوەشدا ئەگەر یەکێکتان نەخۆش بوو، یان لە سەفەرێ بوو، وە بەڕۆژوو نەبوو باچەند ڕۆژێك لە مانگەکانی دیکە بگرێتەوە، واتە: با ڕۆژانێکی دیکە لەجیاتی ئەو ڕۆژانەی کە نەخۆش بووە، یان کە لە سەفەرێ بووە، بگرێتەوە بەڵام کەسانێك هەن لە سەفەرێ نین‌و نەخۆش نین، بەڵام ڕۆژوویان بەزەحمەت بۆ دەگیرێ ﴿ وَعَلَى الَّذِينَ يُطِيقُونَهُ ﴾، وە ئەوانەش کە زۆر بەزەحمەت‌و دەبێ ئەوپەڕی توانای خۆیان بخەنە گەڕ، ئەوجار ڕۆژوویان بۆ دەگیرێ ﴿ فِدْيَةٌ طَعَامُ مِسْكِينٍ ﴾، ئەوانەش با ڕۆژوونەگرن‌و فیدیە بدەن، قەرەبوویەك بدەن، کە بریتیە لە خواردن دان بە نەدارێك، واتە: ژەمە خواردنێك، با ژەمە خواردنێك بدەن بە برسییەك، لەجیاتی ئەوەی کە ناتوانن بەڕۆژووبن، جا یان لەبەر ئەوەی کە نەخۆشێکی بەردەوامن، یان لەبەر ئەوەی زۆر پیربوون، یان ئافرەت کە منداڵی لە زگدابێ، یان ئافرەت کە منداڵی لەبەربێ، کە شیری پێدەدا، لە هەموو ئەو حاڵەتانەدا، با فیدیە بدەن، بەڵام دیارە ئەوە بۆ کەسێکە کە لە توانایدا نیە، وە ئومێدیشی نیە چاك بێتەوە، بەڵام ئافرەت کە لەبەر ئەوەی منداڵی لە زگ دایە، یاخود لەبەر ئەوەی منداڵی لەبەرەو شیری پێدەدا، بەڕۆژوو نابێ، ئەوە دەبێ دوایی ڕۆژووەکەی بگرێتەوە، وە هەندێك لە زانایان دەڵێن: ئەو فیدیەیە

بۆ ئافرەت نیە، ئافرەت ئاوس (حامل)و شیردەر (مرضع)، بەڵكو تەنیا بۆ كەسێكە كە ڕۆژووی پێ ناگیرێ، چونكە ئافرەت مادام هەر بیگرێتەوە فیدیەی ناكەوێتە سەر وە من ئەم ڕایەم پێ ڕاستو بەهێزە، وەك لە كتێبی (خواپەرستیی ئیسلامیی) بەرگی چوارەمدا، باسم كردوە، ﴿ فَمَن تَطَوَّعَ خَيْرًا فَهُوَ خَيْرٌ لَّهُۥ ﴾، هەركەسێكیش خۆبەخشانە چاكەی زیاد بكات، ئەوە بۆی باشترە ﴿ وَأَن تَصُومُواْ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴾، وە ئەگەر بەڕۆژووبن (واتە: با نەخۆشیش بنو، لە سەفەریش بن مادام لە خۆتان ڕاببینن، بەڕۆژووبوونەكەتان) چاكترە ئەگەر بزانن، دیارە بە مەرجێك بەهۆی ڕۆژووگرتنەكەوە نەخۆشییەكە زیاد نەكاتو سەفەرەكەش سەفەرێكی وانەبێ، كە ئەگەر بەڕۆژووبووی پەكت بكەوێ، ئنجا باسی مانگی ڕەمەزان دەكات، دەفەرموێ: ﴿ شَهْرُ رَمَضَانَ ٱلَّذِىٓ أُنزِلَ فِيهِ ٱلْقُرْءَانُ ﴾، مانگی ڕەمەزانێك كە قورئانی تێدا نێرراوەتە خوار ﴿ هُدًى لِّلنَّاسِ ﴾، ڕێنمایی یە بۆ خەڵك، ئەم قورئانە بۆ هەموو خەڵك ڕێنمایی یە، ئەدی بۆچی لە سەرەتای سووڕەتی (البقرة)دا دەفەرموێ: ﴿ هُدًى لِّلْمُتَّقِينَ ﴾؟ چونكە تەنیا پارێزكاران ئیستفادەی لێدەكەنو تەنیا ئەوان بە كردەوە لێی بەهرەمەند دەبن، ئەگەرنا لە ئەسڵدا خوا بۆ هەموو بەشەری ناردوە ﴿ وَبَيِّنَٰتٍ مِّنَ ٱلْهُدَىٰ وَٱلْفُرْقَانِ ﴾، وە قورئان چەندان ڕوونكردنەوەی تێدا هەن، وە جیاكەرەوەیە لە نێوان هەقو باطڵ، چاكو خراپ، ڕاستیو درۆدا، ﴿ فَمَن شَهِدَ مِنكُمُ ٱلشَّهْرَ فَلْيَصُمْهُ ﴾، جا هەركامێك لە ئێوە لەمیانەی ئەم مانگەدا لەماڵی خۆی بوو، ئامادە بوو، با بەڕۆژووبێ، نەك هەركەس مانگی بینی، چونكە نەیفەرمووە: (فَمَن شَهِدَ مِنكُم القَمَر)، وە ﴿ شَهِدَ ﴾، لێرەدا بەمانای (حَضَرَ) دێت، نەك بەمانای (رَأى)، واتە: هەركامێك لە ئێوە ئامادە بوو، نیشتەجێ بوو، لە ماڵی خۆی بوو، لە

سەفەرێ نەبووو نەخۆشیش نەبوو، بابیگرێ ﴿ وَمَن كَانَ مَرِيضًا أَوْ عَلَىٰ سَفَرٍ فَعِدَّةٌ مِّنْ أَيَّامٍ أُخَرَ ﴾، بەڵام هەرکەس نەخۆش بوو، یان لە سەفەرێ بوو (واتە: بەڕۆژوو نەبوو)، با بە ئەندازەی ئەو ڕۆژانەی کە خواردوونی، لە ڕۆژانی دیکە بگرێتەوە، لە کۆتاییدا دەفەرموێ: ﴿ يُرِيدُ اللَّهُ بِكُمُ الْيُسْرَ ﴾، خوا ئاسانیی بۆ ئێوە دەوێ، کە ئاوا بەو شێوەیە ڕۆژانێکی کەمی لەسەر فەرز کردوون، ماوەکەی کەمەو ئەگەر نەخۆشیش بوون یاخود لە سەفەریش بوون دوایی دەیگرنەوە، یاخود ئەگەر هەر بۆتان نەگیرا، فیدیەتان لێوەردەگیرێ، ئەوە هەمووی ئاسانکردنە لەلایەن خوای پەروەردگارەوە ﴿ وَلَا يُرِيدُ بِكُمُ الْعُسْرَ ﴾، وە (خوای بە بەزەیی) نایەوێ باری شانتان قورس بێتو، نایەوێ سەغڵەتتان بکاو، ناڕەحەتتان بکات ﴿ وَلِتُكْمِلُوا الْعِدَّةَ ﴾، (بۆیە خوا ئاسانکارییتان بۆ دەکات) تاکو ژمارەکەی تەواوبکەن {لە سەفەرێ چەندتان خواردبوو، بە نەخۆشیی چەندتان خواردبوو، تەواوی بکەن، مانگ (٢٩) بوو (٢٩)ی تەواو بکەنو، (٣٠)ی بوو (٣٠)ی پڕ تەواو بکەن} ﴿ وَلِتُكَبِّرُوا اللَّهَ عَلَىٰ مَا هَدَاكُمْ ﴾، وە بۆ ئەوەی خوا بەگەورە بگرن بەهۆی ئەوەوە کە ئێوەی ڕێنمایی کردوە، (واتە: کە مانگی ڕەمەزانتان تەواو کرد (الله أكبر)ەکان بکەن، لەسەر ڕای زۆر لە توێژەرەوانی قورئان) ﴿ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴾، (وە خوا ﷻ ئەو ئاسانکاریيانەی بۆ ئێوە هێناوەتە پێش، وە ئەو عیبادەتە گەورەیەی لەسەر ئێوە فەرز کردوە) بۆ ئەوەی سوپاسگوزاریی بکەن، واتە: ئێوە کاتێك بەندایەتیی بۆ خوا دەکەن، دەبێ مەمنوون بن، کە خوا ڕێی پێداون بیپەرستنو، ئەو لوتفەی لەگەڵ کردوون کە بفەرموێ: بەوە لێتان ڕازی دەبم، لە ڕاستیدا ئینسان دەبێ سوپاسگوزاربێ بۆ خواو، عیبادەتەکەی بە مەمنوونییەوە ئەنجام بدا، مادام خوا فەرمانی پێکردوە، دەبێ وەك بەخششو خەڵات تەماشای بکەن.

## چەند مەسەلەیەکی گرنگ

**مەسەلەی یەکەم:** یەکەم شت کە دەمەوێ ئاماژەی پێ بکەم لەم ئایاتانەدا، ئەوەیە کە بۆ جاری پێنجەم لەم سوورەتە موبارەکەی (البقرة)دا ڕستەی: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ﴾، دووبارە دەبێتەوە، کە وەك پێشتریش باسم کرد لەم سوورەتی (البقرة)دا یازدە (١١) جاران ئەم ڕستە موبارەکە هاتوە، وە هەموو جارێکیش لە سەرەتای باسکردنی بابەتێکی گەورەو گرنگەوە هاتوە، لێرەدا لە سەرەتای باسکردنی یەکێك لە پایەکانی ئیسلام هاتوە، کە بریتیە لە ڕۆژووگرتی مانگی ڕەمەزان، خوا ﷻ ئیمەی ئیماندار دەدوێنێ‌و دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُتِبَ عَلَيۡكُمُ ٱلصِّيَامُ ﴾، ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە ڕۆژووگرتنتان لەسەر پێویست کراوە.

**مەسەلەی دووەم:** ڕۆژووگرتن یانی چی؟ لە پێشتر باسمان کرد کە (صیام و صوم) لە ئەسڵی زماندا یانی چی؟ بەڵام لە پێناسەی شەرعدا زانایان بەم شێوەیە پێناسەیان کردوە، بۆ وێنە: (القُرطُبي)[1] دەڵێ: ((الصَوْمُ في الشَّرْعِ: الإمسَاكُ عَن المفطِراتِ مَعَ إقتِرانِ النيِّةِ بِهِ مِن طلوعِ الفَجْرِ إلى غُرُوبِ الشَّمسِ وَتَمَامُهُ وَكَمَالُهُ باجتِنابِ الْمَحْظُورَاتِ وَعَدَم الوُقُوع في المُحَرَّمَات))، واتە: ڕۆژووگرتن لە زاراوەی شەرعدا: بریتیە لە خۆگرتنەوە لەو شتانەی کە ڕۆژوویان پێ هەڵدەوەشێتەوە، لەگەڵ هەبوونی نیەت لە سپێدەی بەرەبەیانەوە هەتاکو ئاوابوونی خۆر، وە تەواویەکەشی (تەواوبوونی ڕۆژوو) بەوە دەبێت، کە ئینسان خۆی لە هەموو ئەو شتانە بپارێزێ کە خوا قەدەغەی کردوون، وەبێ فەرمانیی خوا نەکات. دیارە پێشتر باسمان کرد کە ڕۆژوو بە خواردن‌و خواردنەوەو بە جووتبوون (جماع) یان بەهەر شێوەیەك لە

---

١) بروانە: (الجامع لأحكام القرآن)، ج: (٢)، ص: (٥٠٨).

شێوەکان مرۆڤ ئاوی بێتەوە، مادام بە ئاگاداریو بەدەستی خۆی بێ، ئەوە ڕۆژوو بەوە دەشکێو هەڵدەوەشێتەوە، دەربارەی ئەوە کە ڕۆژووگرتن تەنیا ئەوە نیە ئینسان دەمو داوێنی بەڕۆژوو بێت، بەڵکو پێویستە دڵو دەروونیو عەقڵو هۆشو ئەندامەکانیشی بپارێزێ، دیارە هەمیشە ئینسان دەبێ خۆی بپارێزێ لە گوناح، بەڵام لە کاتی ڕۆژووگرتندا دەبێ زیاتر لە خۆی وریابێ، بۆ ئەوەی ئەو عیبادەتو خوا پەرستییەی کە ڕۆژووگرتنە، چاك جێگا بگرێو چاکتر قەبووڵ بێ، لەوبارەوە ئەو فەرموودە هەیە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {(مَنْ لَمْ يَدَعْ قَوْلَ الزُورِ، وَالجَهلِ، وَالعمَلَ بهِ، فَلَيسَ لِلَّهِ حَاجَةٌ فِي أَنْ يَدَعَ طَعَامَهُ وشَرَابَهُ) (رَوَاهُ البُخَارِيُّ برقم: (٦٠٥٧)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٢٣٦٢)، وَالتِّرمِذِيّ برقم: (٧٠٧)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (١٦٨٩)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٣٤٨٠)، عَن أَبي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ}، واتە: هەرکەسێك قسەی درۆ یان قسەی لارو نەفامانە (قسەی خراپو حەرام) وە کردەوەی خراپو حەرام واز لێ نەهێنێ، خوا هیچ پێویستی بەوە نیە کە خواردنو خواردنەوەکەی واز لێ بێنێ، واتە: خوا پێویستیی بەوە نیە خۆی برسییو تینوو بکات، مادام خۆی لە گوناهان نەپارێزێ، هەڵبەتە لێرەدا مەبەست ئەوە نیە کە ئەگەر خۆی لە قسەو کردەوەی درۆو نەفامانە بێنێ. خوا پێویستیی پێیە !! لە هیچ حاڵان داخوا هەر پێویستی پێ نیە، بەڵام لە حاڵی پاریزکردن لەو شتانەدا ڕۆژووەکەی قەبووڵو لە حاڵی پاریزنەکردندا قەبووڵ نابێ.

<u>مەسەلەی سێیەم</u>: ڕۆژووگرتنی مانگی ڕەمەزان، یەکێکە لە پێنج پایەکانی ئیسلام، دیارە خوا ﷻ لێرە هەر فەرموویەتی: ﴿ كُتِبَ عَلَيْكُمُ ٱلصِّيَامُ ﴾، ڕۆژووگرتنتان لەسەر پێویست کراوە، کە دوایی بەپێی سیاقی ئایەتەکان بۆمان دەردەکەوێ کە مەبەست پێی مانگی ڕەمەزانە، چونکە دوایی دەفەرموێ: ﴿ شَهْرُ رَمَضَانَ ٱلَّذِىٓ أُنزِلَ فِيهِ ٱلْقُرْءَانُ ﴾، بەڵام لە سوننەتی پێغەمبەردا ﷺ ئەوەش ڕوونکراوەتەوە، کە گرتنی ڕۆژووەکانی مانگی ڕەمەزان، یەکێکە لە

پێـنج پایـەکانی مـسولْمانەتییو دینـداریی شەخـصیی، وەك پێغەمبـەر ﷺ فەرموویەتی: {(بُنِـيَ الإِسلاَمُ عَلَى خَمْسٍ: شَهادَةِ أَنْ لاَ إِلَـهَ إِلاَّ اللّه، وَأَنَّ مُحَمَّـداً رَسولُ اللّهِ، وَإِقَامِ الصَّلاَةِ، وإِيتَـاءِ الزَكَـاةِ، والحَجِّ، وَصَوْمِ رَمَضَانَ) (رَوَاهُ البُخاري بـرقم: (٨)، ومُـسلم بـرقم: (١١٤)، والتِّرمِـذِيّ بـرقم: (٢٦٠٩)}، واتــە: ئیـسلام لەسەر پێنج شتان بنیاتـنراوە: شایەتمان بـەوە کـە بێجگـە لـە خـوا پەرسـتراوی دیکـەنین، وە کـە موحەممـەد ڕەوانـەکراوی خوایـە، وە بـەرپاکردنی نوێـژ، وە زەکاتـدان، وە حـەج کـردن، وە گرتنـی ڕۆژووی مـانگی ڕەمـەزان، لێـرەدا زۆر لـە مسولْمانان وا حالْین کە مەبەسـتی پێغەمبەر ﷺ ئەوەیـە کـە هەرکەسێك ئـەو پێنج شتەی ئەنجامدان، مانای وایە مـسولْمانەتیی تـەواو کـردوە، بـەلاّم دەمـەویٚ هەموو لایەکتان بزانن کە مەبەست لە ئیسلام لێرەدا مسولْمانەتیی شەخصییەو هەر کات مرۆڤ ئەم پێنجانـە لەخۆیـدا ئـەنجام بـدا، ئنجا وەك شـەخص دەبێتـە مـسولْمان، شـایەتمان هێنـان کـە ئیمـانو عەقیـدە دەگرێتـەوە نێوخـۆی، وە بـەرپاکردنی پێـنج فـەرزەی نوێـژ، زەکاتـدان، ڕۆژووگـرتن، حـەج کـردن، ئەوانـە پێنج درووشمو نیشانەن بۆ ئـەوەی کـە ئێمـە بـزانین ئـەو شەخـصە مـسولْمانە یان نا ؟ ئەمما ئەگەر مـسولْمانەتیی لـەو پێنجانـەدا کورت بێتـەوە، مانـای وایـە ئەو هەموو ئایەتو یاساو ئەو هەموو شتانەی دیکـە کـە لـە قوڕئـانو سـوننەتدا باسکراون، دەبیٚ زیـادبن ! کە بە تەئکید وانیـەو مەبەسـت لـەم پێنجانـە، پێـنج درووشمو نیشانەن، کە ئێمە بزانین ئەو شەخـصە مـسولْمانە یـان نـا ؟ تەماشا دەکەین: ئەگەر شایەتمانی هێنا دەزانین کە ئەوە تەعبیـر لـە ئیمانو عەقیـدەی مسولْمانەتیی خۆی دەکات، وە ئەگەر نوێژی کرد، دەزانین کە ئەوە بەندایـەتیی بـۆ خـوای خـۆی دەکـات، وە ئەگـەر زەکـاتی داو ڕۆژووی گـرتو حـەجی کـرد، دەزانـین کـە ئـەو شـەخـصە شەخـصێکی پابەنـدە بـە ئیـسلامەتییەوە، بـەلاّم ئیسلامەتیی بە تەئکید لەو پێنجانەدا کورت هەلْنـەهاتوە.

مەسـەلەی چوارەم: پاداشـتو پلـەو پایەی ڕۆژووگـرتن چییەو چۆنە؟ پێغەمبـەر ﷺ فەرمایـشتی زۆرن لـەوبارەوە کـە ڕۆژووگـرتن پلــەو پایەکـی بــەرزو

پاداشتێکی گەورەی هەیە:

١) {(عَنْ أبي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسولَ اللهِ ﷺ قَالَ اللهُ ﷻ: كُلُّ عَمَلِ ابْنِ آدمَ لَهُ، إلاَّ الصِّيَامَ، فإنَّهُ لي وَأنا أجْزِي بِهِ، وَالصِّيَامُ جُنَّةٌ، وَإذَا كَانَ يَوْمُ صَومِ أحَدِكُمْ فَلاَ يَرْفُثْ وَلاَ يَسخَبْ، فإنَ سَابَّهُ أحَدٌ أو قَاتَلَهُ، فلْيَقُلْ إنِّي امْرُؤٌ صَائِمٌ، وَالَّذي نَفسُ مُحَمَّد بِيَدِهِ! لَخُلُوفُ فَمِ الصَّائِمِ أطيَبُ عِندَ اللهِ، يَوْمَ القيَامَةِ، مِنْ رِيحِ الْمِسْكِ، لِلصَّائِمِ فَرحَتَانِ يَفرَحُهُمَا: إذَا أفْطَرَ فَرِحَ بِفطرِهِ، وَإذَا لَقِيَ رَبَّهُ فَرِحَ بِصَوْمِهِ) (مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ، البُخَاري بِرقم: (١٩٠٤)، وَمُسْلِم بِرقم: (٢٧٠٠)، وَالنَّسَائِيُّ بِرقم: (٢٢١٥)}، پێغەمبەر ﷺ ئەم فەرمایشتە بەشێکی لە خواوە دەگێڕێتەوە کە پێی دەگوترێ: فەرموودەی قودسیی، فەرموودەی قودسیی ئەوەیە خوا فەرموویێتی، بەڵام پێغەمبەر ﷺ بە وشەو داڕشتنی خۆی دایبڕێژێ، فەرقی لەگەڵ قورئان ئەوەیە کە قورئان وشەو داڕشتنەکەشی هی خوایەو، ماناو مەبەستەکەشی هی خوایە، بەڵام بەشی دووەمی فەرمایشتەکە هەر فەرموودەی ئاسایی پێغەمبەرە ﷺ، واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: خوای بەرزو مەزن فەرموویەتی: هەموو کردەوەی ئادەمیزاد بۆ خۆیەتی جگە لە ڕۆژووگرتن (واتە: ڕۆژووگرتن هیچ بەشی نەفسی تێدا نیە، ئەگەر ئینسان بە ساغی بۆ خوا نەیکات، نایکات، بەڵام دەگونجێ لە نوێژکردندا، لە زەکاتداندا، ئینسان ڕووپامایی و ڕوودەربایسی خەڵکی بکات) ڕۆژووگرتن تەنیا بۆ منە وە منیش پاداشتی دەدەمەوە وە ڕۆژووگرتن قەڵغانە، {واتە: وەك چۆن قەڵغان (سوپەر) ئینسان دەپارێزێ، کاتێ خۆی سوپەریان بەکاردەهێنا بۆ ئەوەی لە تیرو شیرو ئەوانە پارێزراوبن، ئاوا ڕۆژووگرتنیش قەڵغانێکە ئینسان دەپارێزێ، هەم لە شەیتان هەم لە گوناح و تاوان} ئەگەر ڕۆژێ تێیدا بەڕۆژوو بوون (واتە: یەکێکتان بەڕۆژوو بوو) با وشەی ناشیرین و ناقۆڵا نەڵێ، بەتایبەتی ئەوەی پەیوەندی بەلایەنی جینسییەوە هەیە نەیڵێ، وە با گاڵە گاڵ و قڕەقڕ نەکات، جا ئەگەر

كەسێك جنێوی پێدا یاخود شەڕی پێ فرۆشت، با بڵێ: من بەڕۆژووم (لەگەڵی نەچێتە تەرازوویەوە)، ئەوەندە فەرمایشتی خوایە پاشان، پێغەمبەر ﷺ بۆخۆی دەفەرموێ‌و زۆر جار سوێندی بەم شێوەیە خواردوە: سوێند بەو كەسەی كە گیانی موحەممەدی بەدەستە بۆنی گۆڕراوی دەمی ڕۆژووەوان لەلای خوا خۆشترە لە بۆنی میسك {ڕۆژووەوان تامی زارو بۆنی زاری دەگۆڕێ، ئەو بۆنە گۆڕاوە، لای خوا لە بۆنی میسك خۆشترە} ڕۆژووگر دوو دڵخۆشی بۆ هەن، كە پێیان دڵخۆش دەبێ، كە یەكێكیان هەركاتێك بەربانگی كردەوە، پێی دڵخۆش دەبێ، وە كاتێك دەگاتە پەروەردگاریشی دڵیخۆش دەبێ بە ڕۆژووەكەی، (كە پاداشتەكەی دەبینێ چەندە گەورەیە، پێی دڵخۆش دەبێ).

٢) لە فەرمایشتێكی دیكەدا پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {(مَا مِنْ عَبْدٍ يَصُومُ يَوْمَاً فِي سَبِيلِ اللهِ، إلاَّ بَاعَدَ اللهُ، بِذَلِكَ اليَوْمِ، وَجْهَهُ عَنِ النَّارِ سَبْعِينَ خَرِيفَاً) (مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ، البُخَارِيُّ برقم: (٢٨٤٠)، وَمُسْلِم برقم: (٢٧٠٤)، عَنْ أَبي سَعِيدِ الخُدريّ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ}، واتە: هەر بەندەیەك یەك ڕۆژ لەڕێی خواداو لە پێناوی خودا بەڕۆژووبێ، خوا حەفتا ساڵە ڕێ بەهۆی ئەو ڕۆژەوە دەم‌وچاوی لە ئاگری جەهەننەم دووردەخاتەوە.

٣) ئەمەش فەرمایشتێكی دیكەی پێغەمبەرە ﷺ، كە ئەمەیان دەربارەی خودی ڕۆژوو گرتنەكەیە، فەرموویەتی: {(مَنْ صَامَ رَمَضَانَ إِيْمَانَاً وَاحتِسَاباً، غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ) (رَوَاهُ البُخَارِيُّ برقم: (١٩٠١)، وَمُسْلِمٌ برقم: (١٧٧٨)، وَالنَّسَائِيُّ برقم: (٢٢٠٥)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (١٦٤١)، عَنْ أَبي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ)، واتە: هەركەسێك ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان بگرێ بە بڕوا پێبوونەوەو بە خوا پێ مەبەستبوونەوە {(احتسابا)، واتە: بەس لای خوا پاداشتەكەی حیساب بكات‌و چاوەڕێی هیچی دیكە نەبێت} ئەوە خوا لە گوناهی ڕابردووی خۆش دەبێت.

٤) ئنجا ئەمەش فەرمایشتێكی دیكەیە دەربارەی شەو نوێژی مانگی ڕەمەزان، كە ئەو تەراویحەیە ئێمە دەیكەین، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {(مَنْ قَامَ

رَمَضَانَ ايمَانـاً وَاحْتِسَـاباً، غُفِـرَ لَـهُ مَاتَقَـدَّمَ مِنْ ذَنبِـهِ) (رَوَاهُ البُخَارِيُّ بـرقم: (٢٠٠٩)، وَمُسْلِمٌ بـرقم: (١٧٧٦)، عَنْ أَبـي هُرَيْـرَةَ ﵁}، واتـە: هـەر كەسـێك شـەونوێژ لـە مـانگی ڕەمەزانـدا بكـات، بـە بـڕوا پێبوونـەوەو بـە خـوا پـێ مەبەست بوونەوە، خوا لە گوناهـی پێشـووی دەبووری.

٥) وە لە فەرمایشتێكی دیكەدا پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {(إِذَا جَاءَ رَمَضَانَ فُتِّحَت أَبوَابُ الجنَّـةِ، وَغُلِّقَـتْ أَبوَابُ النّـَارِ، وصُفِّدَتِ الشَّيَاطِينُ) (مُتَّفَـقٌ عَلَيْـهِ، البُخَارِيُّ برقم: (١٨٩٩)، وَمُسْلِم بـرقم: (٢٤٩٢)، عَن أَبـي هُرَيْـرَةَ ﵁} واتە: كە ڕەمەزان هـات دەرگـاكـانی بەهەشـت ئاوەڵا دەكرێن و دەرگاكانی دۆزەخ دادەخرێن، وە شەیتانەكانیش زنجیـر دەكرێن. دیارە مەبەسـت پـێ ژمارەیـەكی زۆرە لە شەیتانەكان، ئەگەرنا بایی ئەوەندە كە ئینسان تاقی بكرێتەوە شـەیتان دەمێـنن، وە بەڕاسـتیش فەرموودەكـە زیـاتر مەبەسـت پێـی زنجیـركرانی شەیتانەكانە لە ئاست ڕۆژووەوانەكاندا، ئەگەرنا خەڵـكی بێـڕۆژوو، كـە ڕەنگـە هەر بێ ئیمانیش بێ، ئەوە بە تەئكید بۆتە كۆیلە بەدەسـت شـەیتانەكانەوەو، بۆتە تۆپێـك بەكـەیفی خۆیـان گەمـەی پـێ دەكـەن، وەك دەبیـنن كەسـانێك لـە مانگی ڕەمەزاندا، هیچ حورمەت و ڕێز نە بۆخۆیان و نە بۆ طاعەت و دینداریی و مـسوڵمانەتیی و، نـە بـۆ هەسـت و نەسـتی مـسوڵمانانیش دانانێت، ئـا ئەوانـە بەڕاستی نەك شـەیتان لێیـان دوور نەكەوتۆتـەوە، بـەڵكو وەك گوتم ڕەنگـە لـە پێش ڕەمەزاندا زیـاتر گـەمەو یارییـان پـێ بكـەن !!

**مەسـەلەی پێنجەم:** كە خوای بەرز دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُتِبَ عَلَيۡكُمُ ٱلصِّيَامُ كَمَا كُتِبَ عَلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِكُمۡ ﴾، تـوێـژەرەوانی قورئـان زۆریـان شـت لەسـەر گوتـوە، كـە ئایـا مەبەسـت لـەوە چییە كـە خـوا دەفـەرموێ: ﴿ كَمَا ﴾ مەبەست لەو لێكـچواندنە چییـە؟

**یەكـەم:** ئایـا ئـەو ڕۆژووەی لەسـەر ئێمـە پێویـست كـراوە، هـەر هـەمان ڕۆژووش لەسـەر ئەوانی پێش ئێمەش فەڕز كـراوە؟

**دووەم:** ئەوانەی پێش ئێمە كێن؟ مەبەست تەنیا جوولەكەو نەصرانیی یەكانن، یاخود هەموو بەشەریەتە، یاخود تەنیا نەصرانیی یەكانن؟ یان كێن؟

بەڵام ئەوەی كە من دەیبینم لەم دەقەدا، خوا ﷻ بەگشتی باسی ڕۆژوو دەكات، دەفەرموێ: وەك چۆن ڕۆژوو لەسەر ئێوە پێویست كراوە، لەسەر ئەوانی پێش ئێوەش پێویست كراوە، واتە ئەسڵی پێویست كرانەكەو ئەسڵی ڕۆژووگرتنەكە، وەك یەكە، بەڵام مەرج نیە لە هەموو وردەكارییەكانیدا وەك ڕۆژووی ئەوان بێت، چونكە ئەوەتا مەریەم ئەو ڕۆژە كە عیسای بووە، دەڵێ خوای پەروەردگار پێی فەرمووم كە بڵێم: ﴿إِنِّي نَذَرْتُ لِلرَّحْمَٰنِ صَوْمًا فَلَنْ أُكَلِّمَ الْيَوْمَ إِنسِيًّا ﴿٢٦﴾﴾، واتە: من ئەمڕۆ ڕۆژووم لەخۆم گرتوە بۆ خوای خاوەن بەزەیی‌و، قسە لەگەڵ هیچ ئینسانێك ناكەم، دیارە ڕۆژووی ئەوان لەسەریان پێویست بووە قسەش نەكەن، یاخود ڕەنگە هەر قسەنەكردنەكە بۆ خۆی بەڕۆژوو دانرابێ، كە لە شەریعەتی ئێمەدا وانیە، یاخود لەلایەكی دیكەوە ئافرەتی زەیستان دیارە بۆی نیە بەڕۆژووبێ، بەڵام دیارە ئەو بۆی هەبووە، كەواتە: مەرج نیە هەموو وردەكاریی‌و تەفاصیلی ڕۆژووگرتنی ئەوانی پێش ئێمە، وەك هی ئێمە بووبێ.

ئنجا كە دەشفەرموێ: ﴿كَمَا كُتِبَ عَلَى الَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ﴾، ئەوەی كە دەردەكەوێ لە مێژووی پێغەمبەرانیشدا، ئەوەیە كە خوا هیچ شەریعەتێكی بۆ هیچ پێغەمبەرێك نەناردوە، كە نوێژی تێدا نەبووبێت‌و ڕۆژووی تێدا نەبووبێت، ئەو دووانە لە هەموو شەریعەتەكاندا بوون.

**مەسەلەی شەشەم:** كە دەفەرموێ: ﴿لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ﴾، پێشتر باسمان كرد (لَعَلَّ) بۆ ئومێدو هیوا بوونە بە شتێك، جا ئایا مەبەست لێرەدا چییە؟

دیارە ﴿لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ﴾، واتە: ئومێد وایە پارێزكاریی بكەن، ئومێد وایە تەقواتان پەیدابێ، ئێمە دەڵێین: بەڕاستی ئەم ڕستە قورئانییە چەمكەكەی

زۆر فراوانەو ناتوانین تایبەتی بکەین بە شتێك و دوو شتەوە.

جارێ لە فەرمایشتێکدا پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {(يَا مَعْشَرَ الشَّبَابِ، مَنِ اسْتَطَاعَ الْبَاءَةَ فَلْيَتَزَوَّجْ، فَإِنَّهُ أَغَضُّ لِلْبَصَرِ، وَأَحْصَنُ لِلْفَرْجِ، وَمَنْ لَمْ يَسْتَطِعْ فَعَلَيْهِ بِالصَّوْمِ، فَإِنَّهُ لَهُ وِجَاءٌ) (رَوَاهُ الْبُخَارِيُّ بِرقم: (١٩٠٥)، وَمُسْلِمٌ بِرقم: (٣٣٨٤)، وَالتِّرمِذِيُّ بِرقم: (١٠٨١)، وَالنَّسَائِيُّ بِرقم: (٢٢٤٢)، وَابْنُ مَاجَهْ بِرقم: (١٨٤٥)، عن عَبْدِ اللَّهِ بْنُ مَسْعُودٍ رضي الله عنه}، واتە: ئەی کۆمەڵی گەنجان! هەرکامێك لە ئێوە توانی (توانای جەستەیی و توانای دارایی بوو) با هاوسەر بگرێ، بۆ چاوی باشترە (کە چاو ناگێڕێ لە ئافرەتان، کە کابرا حەلاڵی خۆی هەبێت، مادام ئیمانێکی باشی هەبێ، چاوی لە حەرام نابێ) وە بۆ داوێن پاکیشی چاکترە، وە هەرکەسێك نەیتوانی با ڕۆژوو بگرێ، ئەوە دەبێتە مایەی ئارەزوو کەمبوونەوەی، (وِجَاءٌ) بەمانای خەساندن دێ، هەڵبەتە ئەوە شتێکی تەجرەبەکراوە، کە ڕۆژووگرتن دەبێتە هۆی ئەوە کە ئینسان ئارەزووی جینسیی کەمبێتەوە، دیسان ڕۆژووگرتن دەبێتە هۆی ئەوەی کە ئیرادەو ویستی بەهێزبێ و زیاتر خۆی کۆنترۆڵ بکات.

**<u>بەرهەمی ڕۆژوو</u>**[1]: لەڕاستیدا ڕۆژوو گرتن جگە لەوەی کە ئەوە ئەرکێکی شەرعییەو واجبێکە خوا لەسەر ئێمەی داناوەو یەکێکە لە پێنج پایەکانی مسوڵمانەتیی شەخصییمان و دەبێ ئەنجامی بدەین، لە چەند ڕوویێکەوەش سوودی هەیە:

١- لەڕووی مەعنەوییەوە: سوودی زۆرمان پێدەگەیەنێ، ڕووحی ئینسان صاف دەکات و دڵی ئینسان خاوێن دەکاتەوەو، ئینسان لە خوا نزیك دەکاتەوەو، ئیشراقاتی ڕووحی تێدا زیاد دەبێت، ئینسان هەست دەکات لەوکاتەدا کە بەڕۆژوویە ئینسانێکی دیکەیە، هەست دەکات ڕۆشنایی ڕووحیی و قەلبیی زۆرە.

---

١) لە بەرگی چوارەمی کتێبی: (خواپەرستیی ئیسلامیی لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەت دا)دا، بەدرێژی باسی ڕۆژووگرتن و بەرهەمەکانمان کردوە.

٢- لەڕووی ئەخلاقییەوە: بەڕاستی ڕۆژوو کاریگەریی زۆری هەیە بۆ جوانکردنی ئەخلاقی ئینسان - وەك لە ڕابردووشدا باسمکرد — هەرچەندە بەداخەوە هەندێك لە مسوڵمانان بە پێچەوانەوە حاڵی بوونو پێیان وایە کە ئەگەر بەڕۆژووبوون، بەڕۆژووبوونەکەیان بیانوویە بۆ ئەوەی تەنگە پرێسکەبنو بێ حەوسەڵەبنو زوو تووڕەبن، لە حاڵێکدا کە ڕۆژووگرتن بۆ ئەوەیە کە ئینسان ئەخلاقی جوان بێو، خۆی کۆنترۆڵ بکاتو زمانی خۆی بگرێتەوە لە خراپەو صەبری پەیدابێ.

٣- لەڕووی کۆمەڵایەتییەوە: ئینسانی ڕۆژووەوان هەست دەکات، ئەگەر دەوڵەمەندیش بێتو قەتیش برسی نەبووبێ، بەڵام لە مانگی ڕەمەزاندا، لەوکاتەدا کە بەڕۆژوو دەبێ، هەست دەکات کە برسییەکان هەست بە چ ئێشو ژانێك دەکەن.

٤- لەڕووی ئابوورییەوە: ڕۆژووگرتن جۆرێکە لە لێگرتنەوە، هەرچەندە ئەوەشیان وەك گوتم زۆر لە مسوڵمانان بەهەڵە مامەڵە لەگەڵ ڕۆژووگرتنی مانگی ڕەمەزاندا دەکەن، کە ئەوەی لە کاتەکانی دیکەدا بە دوو مانگان دەیخۆن، هەمووی لە مانگی ڕەمەزاندا دەخۆن ! وە ئەو ژەمە نیوەڕۆیەی کە دەیپەڕێنن، بەربانگو پارشێوان بەزیادەوە قەرەبووی دەکەنەوە، کە ئەوکاتە حیکمەتی ڕۆژووگرتنەکەش دەفەوتێ، چونکە ڕۆژووگرتن حیکمەتەکەی ئەوەیە خۆت کۆنترۆڵ بکەیو لێی بگریەوە.

٥- لەڕووی تەندروستییەوە: هەموو پزیشکەکان لەسەر ئەوە یەك دەنگن، کە ڕۆژووگرتن دەبێتە هۆی ئەوەی کە ئەو ماددە زیادانەی لەجەستەدا کۆبوونەوە بۆ وێنە: چەوریی، بتوێنەوە، وە بە هۆی ڕۆژووەوە ئینسان صاف دەبێتەوەو وەك بڵێی جۆرێك لە تەصفیە بوونو لە بێژینگدانی بۆ دێتەدی، بەتایبەتی کە ڕۆژووەکانی بەردەوام بوون، بەتایبەتیش وەك گوتم ئەگەر لە پارشێوو بەربانگدا ڕەچاوی ئەوە بکات، کە ئەوەی نیوەڕۆ نەیخواردوە، قەرەبووی نەکاتەوە!

مەسەلەی حەوتەم: کە دەفەرموێ: ﴿ أَيَّامًا مَّعْدُودَاتٍ ﴾، وەك لە سیاقی ئایەتەکانی دواییدا بۆمان دەردەکەوێ، مەبەست پێی مانگی ڕەمەزانە (معدودات)یش، واتە: ژمێردراو، بۆیەش هەندێ لە توێژەرەوان بە (کەم) یان لێکداوەتەوە، وە لەڕاستیدا شتی کەم ئاسان دەژمێردرێت، وە دوایی دەردەکەوێ کە مەبەست لەو ڕۆژە کەمانەی کە ئینسان تێیاندا بەڕۆژوو دەبێ، مانگی ڕەمەزانە، کە یان (٢٩) یان (٣٠) ڕۆژەو، لەچاو (٣٦٥) ڕۆژیش لە ساڵدا، (٢٩) یان (٣٠) ڕۆژ کەمە.

مەسەلەی هەشتەم: کە دەفەرموێ: ﴿ فَمَن كَانَ مِنكُم مَّرِيضًا أَوْ عَلَىٰ سَفَرٍ فَعِدَّةٌ ﴾، لەوبارەوە زانایان ڕا جیاییان هەیە، کە ئایا نەخۆشییەك کە ئینسان بۆی هەیە تێیدا بە ڕۆژوو نەبێ، کامەیە؟ وە جۆری سەفەرکردنەکە دەبێ چۆن بێت؟ بەڵام من ئەو ڕایەم پێ پەسندترەو بەهێزترە، کە مادام خوا ﷻ بەگشتی باسی نەخۆشیی‌و سەفەری کردوەو دەفەرموێ: ئەگەر نەخۆش بوون، یان لە سەفەرێ بوون، دیارە هەم نەخۆشییەکەی بەگشتی فەرمووەو، هەم سەفەرکردنەکەشی بەگشتی فەرمووە، کەواتە: هەموو جۆرە نەخۆشییەك کە پێی بگوترێ: نەخۆشیی‌و ئینسان لە حاڵەتی ئاسایی بچێتەدەر، ئەوە ئینسان بۆی هەیە تێیدا بەڕۆژوو نەبێ، وە هەموو سەفەرکردنێکیش کە پێی بگوترێ: سەفەرو بە عورفی خەڵك بە سەفەر لەقەڵەم بدرێ، بەهەمان شێوە دروستە تێیدا بەڕۆژوو نەبێ، کە دیارە ژمارەیەك لە زانایان ڕایان وایە بۆ وێنە: لەوبارەوە شەوکانیی لە تەفسیرەکەی بەناوی (فتح القدير)[1]دا دەڵێ: ((وَالْحق أَن مَا صَدَقَ عَلَيْهِ مُسَمّى السَّفَرِ فَهُوَ الَّذي يُبَاحُ عِنْدَهُ الفِطْرُ وَهَكَذَا مَا صَدَقَ عَلَيْهِ مُسَمّى الْمَرَضِ هُوَ الَّذي يُبَاحُ عِنْدَهُ الفِطْرِ))، واتە: وەڕاست ئەوەیە کە هەرچی چەمکی سەفەر بیگرێتەوە، ئەوە ڕەوایە کە ڕۆژووی – ڕەمەزانی- تێدا نەگیرێ، هەروەها هەر نەخۆشییەك کە چەمکی

١) فتح القدير، ج: (١)، ص: (٢٣٧).

وشەی: نەخۆشیی بیگرێتەوە ڕەوایە تێیدا بەڕۆژوو نەبی، هەڵبەتە دوایی هەندێ لە زانایان زۆر وردیان کردۆتەوە کە دەبێ نەخۆشییەکە چۆن بێ‌و چۆن نەبێ ؟! وە نەشیانتوانیوە سنووریکی بۆ دابنێن، کە کام نەخۆشییە بۆت هەیە تێدا بەڕۆژوو نەبی‌و کامیان بۆت نیە؟! هەروەها سەفەریش بەهەمان شێوە نەك هەر بۆ مەسەلەی ڕۆژوو تێدا نەگرتنی، بەڵکو بۆ مەسەلەی نوێژ تێدا کورتکردنەوەش، کە بەڕاستی ئەوەندەی من لێی وردبوومەوە، وەك لە کتێبی (خوا پەرستیی ئیسلامیی) دا، باسم کردوە، هیچ بەلگەیەکی ڕوون نیە لەسەر ئەوە کە شەرعزانان (فُقَهَاء) دەڵێن: دەبێ شەوو ڕۆژێك دووربێ، یاخود سێ شەو سێ ڕۆژ، وە ئەگەر تەماشای ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەریش بکەین ﷺ وێڕای ڕواڵەتی ئایەتەکە، هەر ئەوەمان دەستگیر دەبێ کە سەفەری ڕەها (مطلق السَّفَر) مەبەستە، نەك سەفەرێکی تایبەت‌و ماوە (مَسَافَة) دیاریکراو، {(كَانَ رَسولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا خَرَجَ، مَسِيرَةَ ثَلاثَةِ أَمْيَالٍ أَوْ ثَلاثَةِ فَرَاسِخَ صَلَّى رَكْعَتَيْنِ) (رَوَاهُ مُسْلِم برقم: (١٥٨١)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (١٢٠١)، عَنْ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ رضي الله عنه}، واتە: پێغەمبەر ﷺ ئەگەر ماوەی سێ میل ڕێگا، یان سێ فەرسەخ {میلێك (١٦٠٩) مەترە لەگەڵ هەندێك ڕا جیاوازییدا، وە (فَرْسَخ)یش (٣) میلە} لەماڵ دەرچووبایە دوو ڕکاتی نوێژ دەکرد، (واتە: نوێژە چوار ڕکاتییەکانی کورت دەکردنەوە) مانای وایە پێغەمبەری خوا ﷺ ماوەی کورتی (٣ - ٩) میلیی، بە سەفەر داناوە کە بە کیلۆمەتر دەکاتە (٥ - ١٥) کیلۆمەتر، وە بەگشتی دەتوانین بڵێین: هەم بابای نەخۆش‌و هەم بابای ڕێبوار سێ حاڵەتیان هەن:

١/ بابای نەخۆش یان ڕێبوار حاڵەتەکەیان وایە، ڕۆژووەکەیان هەر بۆ ناگیرێ.

٢/ بابای نەخۆش یان ڕێبوار حاڵەتەکەیان وایە، کە زۆر بەزەحمەت ڕۆژوویان بۆ دەگیرێ.

٣/ بابای نەخۆش یان ڕێبوار حاڵەتەکەیان وایە، بە ئاسانیی دەتوانن ڕۆژوو بگرن.

هی یەكەمیان كە هەر بۆی ناگیرێ، حەرامە بەڕۆژووبێ، هی دووەمیان كە زۆر بە زەحمەت بۆی دەگیرێ سوننەتە بەڕۆژوونەبێ، هی سێیەمیان كە بە ئاسانی بۆی دەگیرێ واباشە بەڕۆژووبێ، ئەوە ڕای زۆربەی زانایانی لەسەرە.

لەوبارەوە ئەو بەسەرهاتە بوخاریی گێڕاویەتەوە، دەڵێ من كاتێك نەخۆش بووم (إسحاق بن راهويه) هات بۆ لام سەردانی كردم گوتی: {(أفطرتَ يا أَبا عَبْدالله؟ فَقُلْتُ: نَعَمْ. فَقَالَ: خَشيتُ أنْ تَضْعُفَ عَنْ قبُولِ الرخصَة، قُلْتُ: حَدَّثَنَا عَبدَان عَنْ عَبدُالله بْنِ الْمُبَارَك عَنْ ابْنُ جُرَيْج، قَالَ، قُلْتُ: لِعَطَاءِ بن رباح، مِنْ أَي الـمَرَض أُفْطِرُ؟ قَالَ: مِنْ أَي مَرَضٍ كَان، كَمَا قَالَ تَعَالَى: ﴿ فَمَن كَانَ مِنكُم مَّرِيضًا أَوْ عَلَىٰ سَفَرٍ ... ﴾[1]}، بوخاریی كە كونیەكەی (أَبو عَبدالله)یە دەڵێ: (إسحاق بن راهويه) هاتە لام نەخۆش بووم سەردانی كردم گوتی: (أبو عبدالله) ڕۆژووت شكاندوە؟ گوتم: بەڵێ، گوتی: ترسام لەوە بێهێزتربی لەوەی ڕوخصەت قەبووڵبكەی، (واتە: عیلمت لەوە كەمتربێ كە مۆڵەتی خوا وەربگری یانی: مادام مۆڵەتەكەت ئیش پێكرد، دیارە بەقوەتی لە عیلمداو چاك لە دین تێگەیشتووی، چونكە هی وا هەیە وا لەدین حاڵی بووە، هەر بە عەزیمەت ئیشێ بكات، ئەگەر سەریشی تێدا فەوتابێ! كە ئەوە وانیە) بوخاریی دەڵێ، منیش گوتم: عەبدان لە عەبدوڵڵای كوڕی موبارەك لە كوڕی جورەیجەوە، ئەو فەرموودەیەی گێڕاوەتەوە، دەڵێ: بە عەطائی كوڕی ڕەباحم گوت: ئێمە لە كام جۆرە نەخۆشیی بەڕۆژوو نەبین؟ گوتی: هەر جۆرە نەخۆشییەك، وەك خوا فەرموویەتی: ﴿ فَمَن كَانَ مِنكُم مَّرِيضًا ﴾، واتە خوا بەگشتی فەرموویەتیو تۆش بۆت هەیە، كە هەر نەخۆشییەكت گرتو نەخۆش بووی كەوتیەجێ، بۆت هەیە بەڕۆژوو نەبی.

ئنجا ئایا چ سەفەرێك ڕۆژوونەگرتنی تێدا دروستە؟ زانایان گوتوویانە،

---

١) بروانە: (الجامع لأحكام القرآن)، ج: (٢)، ص: (٥١١).

سەفەر سێ جۆرە:

١- سەفەری طاعەت: وەك جیهادو حەج كردنو صیلەی ڕەحم جێبەجێكردنو وێنەی ئەوانە.

٢- سەفەری موباح: وەك بازرگانییو گەشتو سەردانو ئەوانە.

٣- سەفەری حەڕام: وەك ئەوەی كە ئینسان بچێ كەسێك بكوژێ، یان شتێكی حەڕام ئەنجام بدا، جا هەموویان یەك دەنگن لەسەر ئەوە كە دروستە لە سەفەری طاعەتو لە سەفەری موباحدا بەڕۆژوو نەبێت، بەڵام دەربارەی سەفەری حەڕام، زۆربەیان گوتوویانە: دروست نیە بە ڕۆژوو نەبێ، واتە دروست نیە ئەو ڕوخصەتە ئیش پێبكات، بەڵام من پێم وایە مادام ئینسان كە بە سەفەر چوو هەر سەفەرێك بێ، بۆی هەیە بە ڕۆژوو نەبێ، ئنجا ئەگەر سەفەری حەڕام بكات، ئەوە خوا لەسەر سەفەرە حەڕامەكەی سزای دەدا، بەڵام ڕوخصەتو مۆڵەت خوا بۆ هەمووانی فەرمووەو، قەیدو بەندی نەخستۆتە سەر، لەبەر ئەوە بۆ هەمووان وەك یەكە.

**مەسەلەی نۆیەم:** ئێمە چەند فەرموودەیەكی پێغەمبەرمان ﷺ هەن، هەندێكیان ئەوەیان تێدا باسكراوە، كە پێغەمبەر ﷺ لە ڕەمەزاندا بەڕۆژوو نەبووە، وە لە سەفەردا بەڕۆژوو نەبووە، واتە: كە لە ڕەمەزاندا بووەو سەفەری كردوە بەڕۆژوو نەبووە، وە لە هەندێكیاندا هاتوە كە پێغەمبەر ﷺ لە سەفەرێدا بەڕۆژوو نەبووە، جا پێویست دەكات ئەوە ڕوون بكرێتەوە، كە هەركامێك لەوانە تایبەتە بە حاڵەتێكی دیاریكراوەوە:

١/ {(عَنِ ابنِ عبَاسٍ رَضيَ اللهُ عَنهُمَا قَالَ: خَرَجَ رَسولُ اللهِ ﷺ مِنَ المَدينَةِ إلى مَكَّةَ، فصَامَ حَتَّى بَلَغَ عُسفَانَ، ثُمَّ دَعَا بِمَاءٍ، فَرَفَعَهُ إلى يَدَيهِ لِيُرِيَهُ النَّاسَ، فَأفطَرَ حَتَّى قَدِمَ مَكَّةَ، وَذَلِكَ في رَمَضَانَ) (مُتَّفَقٌ عَلَيهِ، برقم: (١٩٤٨)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٢٥٩٩) وَهذَا لَفظٌ للبُخَارِي}، واتە: عەبدوڵڵای كوڕی عەبباس خوا لێیان ڕازی بێ، دەڵێ: ئێمە لە خزمەت پێغەمبەر دابووین

ﷺ له مەدینه دەرچوو بەرەو مەککە بەڕۆژوو بوو، تا گەیشته (عُسَفانَ)، (کە شوێنێکە) لەوێ داوای کرد ئاویان بۆ هێنا، ئاوەکەی بەرزکردەوە بۆ دەستی خۆی بۆ ئەوەی کە پێشانی خەڵکی بدا، وە ڕۆژووەکەی شکاندو بەڕۆژوو نەبوو تا گەیشتە مەککە، ئەوەش لە ڕەمەزان دابوو.

کەواتە: پێغەمبەر ﷺ کە لە ڕەمەزاندا سەفەری کردوە بە ڕۆژووبووە، تا گەیشتۆتە عوسفانو لەوێ شکاندوویەتیو ڕۆژەکانی دیکە هیچیان بەڕۆژوو نەبووە، هەتا گەیشتۆتە شاری مەککە.

٢/ {(عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رضي الله عنه قَالَ: سَافَرْنَا مَعَ رَسولِ اللَّهِ ﷺ فِي رَمَضَانَ فَلَمْ يَعِبِ الصَّائِمُ عَلَى الْمُفْطِرِ، وَلاَ الْمُفْطِرُ عَلَى الصَّائِمِ) (رَوَاهُ مالك برقم: (٦٦٨)، وَالبُخَارِيُّ بِرقم: (١٩٤٧)، وَمُسْلِمٌ بِرقم: (٢٦١٥)، وَأَبُو دَاوُدَ بِرقم: (٢٤٠٥)}، واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: ئێمە لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ لە ڕەمەزاندا سەفەرمان کرد، نە ئەوەی بەڕۆژوو بوو ڕەخنەی لەوە گرت کە بەڕۆژوو نیە، نە ئەوەش کە بەڕۆژوو نەبوو ڕەخنەی لەوەگرت کە بەڕۆژوویە، ئەوەش دەلالەت لەسەر شارەزاییو تێگەیشتنی ئەصحاب دەکات خوا لێیان ڕازی بێ، هەندێ کەس تەبیعەت وشکە کە بۆخۆی بە ڕۆژوو دەبێ، وەك گوتم: ئەگەر سەری خۆی لەسەر دانێ، لە سەفەرێ بێ نەخۆشبێ، ئەگەر یەکێك بەڕۆژوو نەبێ وا دەزانێ تەقوای شلە! بەحیساب خۆی پێ بە تەقواترە ! نازانێ ڕەنگە ئەو کەسەی دیکە لەبەر زێدە شارەزاییو تەقوایی بەڕۆژوو نەبێ، چونکە ئەگەر بەڕۆژوو نەبێ، ڕەنگە ئیشێکی گەورەتر بکات، وەك لە فەرمایشتی پێغەمبەردا ﷺ هاتوە کە لە یەکێك لە جەنگەکاندا هەندێك لە هاوەڵەکان بەڕۆژوو بوون، هەندێکیشیان بەڕۆژوو نەبوون، ئەوانەی کە بەڕۆژوو نەبوون خزمەتی ئەوانی دیکەشیان دەکرد کە بەڕۆژوو بوون، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: {(ذَهَبَ الْمُفْطِرُونَ الْيَوْمَ بِالأَجْرِ كُلِّهِ) (مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ، البُخَارِيُّ بِرقم: (٢٨٩٠)، وَمُسْلِمٌ بِرقم: (٢٦١٧)، وَالنَّسَائِيُّ بِرقم:

(٢٢٨٢)، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ}، واتە: ئەمڕۆ ئەوانەی بەڕۆژوو نەبوون پاداشتەکە هەمووی هی وان بوو.

٣/ {(عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ فِي سَفَرٍ، فَرَأَى زِحَامًا وَرَجُلًا قَدْ ظُلِّلَ عَلَيْهِ، فَقَالَ: (مَا هَذَا)؟ فَقَالُوا: صَائِمٌ، فَقَالَ: (لَيْسَ مِنَ الْبِرِّ الصَّوْمُ فِي السَّفَرِ) (مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ، الْبُخَارِيُّ بِرَقم: (١٩٤٦) وَاللَّفْظُ لَهُ، وَمُسْلِمٌ بِرَقم: (٢٦٠٧)}، واتە: جابری کوڕی عەبدوڵلا خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لە سەفەرێك بوو قەرەباڵغییەکی بینی پیاوێکیش سێبەری لێکرابوو، فەرمووی ئەوە چییە؟ گوتیان: ئەوە بەڕۆژوویە فەرمووی: لە چاکەکاریی نیە لە سەفەرێدا بەڕۆژووبی.

ئەگەر خۆشت ناڕەحەت بکەی‌و، خەڵکی دیکەش ناڕەحەت بکەی‌و سێبەرت لێبکەن، مادام وەزعەکەت وابێ، بەڕۆژوو مەبە، ئەوەش حاڵەتێکی دیکە.

٤/ {(عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ ﷺ قَالَ: خَرَجْنَا مَعَ النَّبِيِّ ﷺ فِي بَعْضِ أَسْفَارِهِ فِي يَوْمٍ حَارٍّ، حَتَّى يَضَعَ الرَّجُلُ يَدَهُ عَلَى رَأْسِهِ مِنْ شِدَّةِ الْحَرِّ، وَمَا فِينَا صَائِمٌ إِلاَّ مَا كَانَ مِنَ النَّبِيِّ ﷺ وَابْنِ رَوَاحَةَ) (مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ، الْبُخَارِيُّ بِرَقم: (١٩٤٥)، وَمُسْلِمٌ بِرَقم: (٢٦٢٥)}، واتە: ئەبو ددەرداء دەڵێ: لە یەکێك لە سەفەرەکاندا لە خزمەت پێغەمبەر بووین ﷺ ڕۆژێکی هێندە گەرما بوو، پیاو دەستی دەخستە سەر سەری خۆی، بۆ ئەوەی تیشکی خۆر لێی نەدا لەبەر گەرمایی‌و، هیچ کاممان بەڕۆژوو نەبووین، جگە لە پێغەمبەری خواو عەبدوڵلای کوڕی ڕەواحە، لێرەدا پێغەمبەر ﷺ ئیشی بەعەزیمەت کردوەو لەوەی دیکەدا ئیشی بەمۆڵەت کردوە.

٥/ {(عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ قَالَ: سَافَرْنَا مَعَ رَسُولِ اللهِ ﷺ إِلَى مَكَّةَ وَنَحْنُ صِيَامٌ، قَالَ: فَنَزَلْنَا مَنْزِلاً، فَقَالَ: رَسُولُ اللهِ ﷺ إِنَّكُمْ قَدْ دَنَوْتُمْ مِنْ عَدُوِّكُمْ، وَالْفِطْرُ أَقْوَى لَكُمْ! فَكَانَتْ رُخْصَةً، فَمِنَّا مَنْ صَامَ وَمِنَّا مَنْ أَفْطَرَ، ثُمَّ نَزَلْنَا مَنْزِلاً آخَرَ، فَقَالَ: (إِنَّكُمْ مُصَبِّحُوا عَدُوِّكُمْ، وَالْفِطْرُ أَقْوَى لَكُمْ فَأَفْطِرُوا)، وَكَانَتْ عَزْمَةً فَأَفْطَرْنَا...) (رَوَاهُ الْبُخَارِيُّ بِرَقم: (٢٤٠٦)،

وَمُسْلِمٌ برقم: (٢٦١٩)}، ئەم فەرمایشتە جوان شتەکەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە، واتە: ئەبو سەعیدی خودریی خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەری خوادا سەفەرمان بەرەو مەککە کردو ئێمە بەڕۆژوو بووین، لە شوێنێك مەنزڵمان دانا (بارگەو بنەمان خست)، پێغەمبەری خوا فەرمووی: ئێوە لە دوژمنتان نزیك بوونەتەوە، ئەگەر بەڕۆژوو نەبن بەهێزتر دەبن لەسەر دوژمنانتان، بەڵام فەرمانی پێ نەکردین کە ڕۆژوو بشکێنین، وە ئەوە مۆڵەت بوو هەمان بوو بەڕۆژوو بوو، هەشمان بوو ڕۆژووەکەی شکاند، دوایی گەیشتینە قۆناغێکی دیکەو، لە شوێنێکی دیکە بارگەو بنەمان خست، ئنجا فەرمووی: ئێوە بەیانی بەسەر دوژمندا دەدەن، وە ئەگەر بەڕۆژوو نەبن بەهێزتر دەبن بۆیە بەڕۆژوو مەبن! (لەسەر دوژمن کە بیشکێنن)، ئنجا عەزیمەت بوو هەموومان ڕۆژوومان شکاند، کەواتە: بەڕۆژووبوون و بەڕۆژوو نەبوون لە سەفەردا، دەگەڕێتەوە بۆ حاڵەتی ئینسان، وە دەگەڕێتەوە بۆ بارودۆخەکە، ئەگەر وای پێویست کرد کە بەڕۆژوو نەبێ، بۆ ئەوەی بەهێزتربێ، پێویستە بەڕۆژوو نەبێ، وە ئەگەر لە خۆت ڕادەبینی کە هەر بەهێزی، هەرچەندە بەڕۆژووش بی، دەتوانی هەر بەڕۆژوو بی، مادام زەحمەتیشت زۆر نەدەکەوتە سەرێ، وەك ئایەتەکەش دەفەرموێ: ﴿وَأَن تَصُومُواْ خَيْرٌ﴾، ئەوکاتە بەڕۆژووبوونەکە باشترە با لە سەفەریش بێ.

<u>مەسەلەی دەیەم:</u> کەسێك گرتنەوەی ئەو ڕۆژانەی کە لە مانگی ڕەمەزان خواردوونی بەهۆی نەخۆشیی، یان بەهۆی سەفەرەوە، دواخستن، هەتا ساڵێکی دیکە ئایا کەفارەتی دەکەوێتە سەرێ و دەبێ فیدیە بدا یان نا[1]؟

(شافعي و أحمد و إسحاق) دەڵێن: بەڵێ، کەفارەتی دەکەوێتە سەرێ، مادام ساڵێکی بەسەردا تێپەڕیوەو دەبێ دوایی کە ڕۆژووەکانی گرتەوە، فیدیەش بدات.

(أبوحنيفة والحسن البصري والنخعي و داود والبخاري) دەڵێن: نەخێر،

---

١) سەرچاوەی پێشوو، ج: (٢)، ص: (٥١٥).

وە بەڕاستی ئەو نەخێرەش بەهێزترە، بۆچی؟ چونکە خوا فەرموویەتی: ﴿فَمَن كَانَ مِنكُم مَّرِيضًا أَوْ عَلَىٰ سَفَرٍ فَعِدَّةٌ مِّنْ أَيَّامٍ أُخَرَ﴾، واتە: هەرکامێك لە ئێوە نەخۆش بوو، یان لە سەفەرێ بوو، چەند ڕۆژێك بە ئەندازەی ئەوە کە خواردوونی لە ڕۆژانی دیکە بگرێتەوە، ئیدی هیچی دیکەی باس نەکردوە، ئەو کەفارەتو فیدیەیە ئایەتەکە دەلالەتی لەسەر ناکات، وە هیچ فەرمایشتێکی ڕاست (صحیح)یش لە پێغەمبەرەوە ﷺ نیە لەوبارەوە.

<u>مەسەلەی یازدەیەم:</u> کەسێك بمرێو ڕۆژووی لەسەربێ، ئایا لەجیاتی دەگیرێتەوە، لە لایەنی کوڕی، یان کچی، یان براو خوشکی، یان خزمی نزیکییەوە؟ لە وەڵامدا دەڵێین: بەڵێ، بەم بەڵگانە:

١) پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((مَنْ مَاتَ وَعَلَيهِ صِيَامٌ صَامَ عَنْهُ وَلِيُّهُ)) (مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ، البُخَارِيُّ برقم: (١٩٥٢)، وَمُسْلِم برقم: (٢٦٨٧)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٢٤٠٠)، عَن عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا}، واتە: هەرکەسێك مردو ڕۆژووی لەسەر بوو، خزمەکەی، (سەرپەرشتیارەکەی، میراتگرەکەی، ئەوەی کە لێی نزیکە) لەجیاتی دەیگرێتەوە.

٢) {(عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا)، قَالَ: جَاءَتِ امْرَأَةٌ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ إِنَّ أُمِّي مَاتَتْ وَعَلَيْهَا صَوْمُ نَذْرٍ - وفي رواية: صَوْمُ شهرٍ - أَفَأَصُومُ عَنْهَا؟ قَالَ: أَرَأَيْتِ لَوْ كَانَ عَلَى أُمِّكِ دَيْنٌ فَقَضَيْتِيهِ أَكَانَ يُؤَدِّي ذَلِكِ عَنْهَا، قَالَتْ: نَعَمْ. قَالَ: فَصُومِي عَنْ أُمِّكِ) (رَوَاهُ البُخَارِي وَمُسْلِم}، واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس دەڵێ: ئافرەتێك هات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! دایکم مردوە ڕۆژووشی لەسەر بووە، ڕۆژووی نەزر، یان ڕۆژووی مانگێك (ڕیوایەتەکان ئاوان) ئایا لەجیاتی بگرمەوە؟ فەرمووی: ئایا ئەگەر دایکت قەرزی لەسەر بووایەو لەجیاتیت دابایەوە، وە بەردەکەوت؟ گوتی: بەڵێ، فەرمووی: مادام وایە لەجیاتی بگرەوە.

**مەسەلەی دوازدەیەم:** كە دەفەرموێ: ﴿ وَعَلَى ٱلَّذِينَ يُطِيقُونَهُۥ فِدۡيَةٞ طَعَامُ مِسۡكِينٖۖ ﴾، بە هەردوو قیرائەتەكان خوێندراوەتەوە، واتە: وە ئەوانەی كە زۆر بەزەحمەت ڕۆژوویان بۆ دەگیرێ، با نەیگرن و خواردنی نەدارێك بدەن، زانایانێك كە دەربارەی ئەم ڕستە قورئانییە دەڵێن: گوایە (نَسْخ) كراوەتەوە، ئەم دەقەش بە بەڵگە دێننەوە: {(عَنْ سَلَمَةَ بنتِ الأَكْوَعِ رَضِيَ اللهُ عَنهُا، كُنَّا فِي رَمَضَانَ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللهِ ﷺ مَنْ شَاءَ صَامَ، وَمَنْ شَآءَ أَفْطَرَ فَافْتَدَى بِطَعَامِ مِسْكِينٍ، حَتَّى أُنْزِلَتْ هَذِهِ الآيَةُ: ﴿ فَمَن شَهِدَ مِنكُمُ ٱلشَّهۡرَ فَلۡيَصُمۡهُۖ ﴾) (رَوَاهُ البُخَارِيُّ بِرقم: (٤٥٠٧)، وَمُسْلِمٌ بِرقم: (٢٦٨١)}، واتە: (سَلَمَةَ بنتِ الأَكْوَعِ) دەڵێ: ئێمە لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ لە ڕەمەزاندا هەمان بوو بەڕۆژوو دەبوو، وە هەمان بوو بەڕۆژوو نەدەبوو، وە خواردنی نەدارێكی دەدا، هەتاكو خوا ئەم ئایەتەی نارده خوارێ: ﴿ فَمَن شَهِدَ مِنكُمُ ٱلشَّهۡرَ فَلۡيَصُمۡهُۖ ﴾، واتە: هەركامێك لە ئێوە ئامادەبوو مانگی ڕەمەزانی بەسەردا هات (واتە: لە ماڵی خۆی بوو) با بیگرێ،

بەڵام زانایانی دیكە كە بەڕاستی من ڕای ئەوانم پێ بەهێزترە دەڵێن: نەخێر ئەم حوكمە قورئانییە هەر لەجێی خۆیەتی و (مُحْكَم)ە، وە ئەم دەقە بەبەڵگە دێننەوە {(رَوى البُخَارِي عَنْ عَطَاءَ أَنَّهُ سَمِعَ ابنَ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا يَقُولُ فِي هَذِهِ الآيَة: لَيْست بِمَنسوخَةٍ، هُوَ الشَّيْخُ الكَبِيرُ، وَالمَرأَةُ الكَبِيرَة، لا يَستطيعَانِ أنْ يَصُومَا، فَيُطعِمَانِ مَكَانَ كُلِّ يومٍ مِسكِيناً) (رَوَاهُ البُخاري برقم: (٤٥٠٥)}، واتە: بوخاریی دەگێڕێتەوە لە (عطاء)ەوە كە گوێی لە عەبدوڵڵای كوڕی عەبباس بووە دەربارەی ئەم ڕستە قورئانییە گوتوویەتی: (مَنْسوخ)نیە، بەڵكو مەبەست لەو كەسە كە دەفەرموێ: ﴿ وَعَلَى ٱلَّذِينَ يُطِيقُونَهُۥ ﴾، پیاوی بە تەمەن و ئافرەتی بە تەمەنە، كە نەتوانن بەڕۆژووبن و، لەجیاتی هەر ڕۆژێك با خواردنی نەدارێك بدەن، (واتە: ژەمە خواردنێك).

هەروەها بوخاریی لەبارەی ئەنەسی كوڕی مالیكەوە گێڕاویەتەوە،[1] كە كاتێك كەوتۆتە تەمەنەوە بەڕۆژوو نەدەبووو، لەجیاتی هەر ڕۆژێك خواردنی نەدارێكی دەدا، گۆشتو نانی دەدا، ئەوە بوخاریی بە (مُعَلَّق)ی لە (كتاب التفسير)دا گێڕاویەتەوە، كەواتە: ئەوانەش كە گوتوویانە (مَنْسوخ)ە، دەگونجێ مەبەستیان پێی تایبەتكردن (تَخْصِيص)بێ، كە وەك لە دەرسەكانی ڕابردوو باسمان كرد، زانایانی پێشین، هەندێكیان وشەی (نَسْخ)یان بەكارهێناوە لەجیاتی (تَخْصِيص)، واتە: خوا پێشێ فەرموویەتی: بەڕۆژووبنو دوایی فەرموویەتی: ئەوانەی بە زەحمەت بۆیان دەگیرێ، با فیدیە بدەن، واتە حوكمەكە پێشێ گشتی بووەو، ئەم ڕستەی دوایی حوكمە گشتییەكەی تایبەت كردوە بەوانەوە، كە بە زەحمەت بۆیان ناگیرێو ئەوەی بە زەحمەت پێی دەگیرێ، بۆی هەیە بەڕۆژوو نەبێو فیدیە بدا.

**مەسەلەی سێزەیەم**: ئەم ڕستەیە كە دەفەرموێ: ﴿ وَعَلَى ٱلَّذِينَ يُطِيقُونَهُۥ فِدۡيَةٞ طَعَامُ مِسۡكِينٖ ﴾، لەسەر ڕای تێكڕا یاخود زۆربەی هەرە زۆری زانایان، ئافرەتی ئاوس و شیردەر (حَامل وَ مُرضِع)یش دەگرێتەوە، {دیارە ناگوترێ (حَاملة و مُرضِعَة)، چونكە هەر ئافرەتان منداڵیان دەچێتە زگەوەو، هەر ئافرەتانیش شیر بە منداڵ دەدەن، بۆیە لە زمانی عەرەبیدا، ئەو شتانەی تایبەتن بە ئافرەتانەوە، پێویست ناكا كە (ة) (تأنيث)یان بچێتە سەرێ}، وە ئەوانەی كە ڕایان وایە ئافرەت كە منداڵی لە سكدایەو ئافرەتی شیردەر (حَامل و مُرضِع) وەبەر ئەم ئایەتە دەكەونو بۆیان هەیە بەڕۆژوو نەبن لە مانگی ڕەمەزاندا، ئەمانەن: (الحَسَن البَصري وعَطَاء ابن أبي رَبَاحَ والضَّحَّاك

---

١) سەرچاوەی پێشوو، ج: (٢)، ص: (٥١٩). كە ئەم دەقەی هێناوە: (و روي عن أنس بن مالك أنه ضَعُفَ عن الصَّوم عاماً، فَصَنَعَ جَفْنَةً من طعامٍ، ثم دعى بثلاثين مسكيناً فأشبعهم)، هەروەها هەمان دەق: (المصباح المنير في تهذيب تفسير إبن كثير)، ص: (١٣١)، لە: (مسند أبي يعلى)وە هێناویەتی.

والنَخَعي والزُهري و رَبيعَة والأوزاعي و أصحاب الرأي: (أبوحنيفة وأبو يوسف ومُحَمَّد بن حسن)، وَ أبوعبيد أبو ثور وابن المُنذر) هەروەها (مالك)یش، بەڵام بەس بۆ ئافرەتێك كە منداڵی لە زگدابێ، ئەگەرنا ئافرەتی شیردەر دەبێت بیگرێتەوە، وە خواردنیش بدا، بەڵام لای ئەو زانایانەی دیكە كە ناوم هێنان دەڵێن: تەنها گێڕانەوەی لەسەرەو خواردن دانی لەسەر نیە، بەڵام ئەوانەی دیكە كە (شافعي وأحمد)یان لەنێودان دەڵێن: دەبێ ڕۆژووەكانیشی بگێڕێتەوەو فیدیەش بدا، بەڵام بەڕاستی ڕای ئەوانە بەهێزترە، كە دەڵێن: ئەو دوو جۆرە ئافرەتە ئەگەر بۆیان گیرا با بیگرن، بەڵام ئەگەر مەترسییان هەبوو لە خۆیان، یان لە منداڵەكانیان، بۆیان هەیە كە ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان نەگرن و دوایی بیگرنەوە، بێ ئەوەی فیدیە بدەن، بەڵام دیارە شافیعی و ئەحمەد دەڵێن: دەبێ بیگرنەوە فیدیەش بدەن، كە فیدیەكە بریتیە لە ژەمە خواردنی هەژارێ[1].

<u>**مەسەلەی چواردەیەم:**</u> كە دەفەرموێ: ﴿ فِدْيَةٌ طَعَامُ مِسْكِينٍ ﴾، ئەوە هەر خوا ﷻ خۆی تەفسیری كردوە، فیدیەكە چییە؟ ﴿ طَعَامُ مِسْكِينٍ ﴾، خواردنی نەدارێك، ئەندازەكەش زانایان: هەندێكیان گوتوویانە: مستێكە كە دەكاتە (٦٧٥) گرام، وە هەندێكیان گوتوویانە: ئەگەر خورما بێ (صاع)ێكە، (صاع)ێكیش چوار مستە، وە ئەگەر گەنم بێ، ئەوە نیو (صاع)ە، (صاع)یش (٢٧٥١) (گرام)ە، دیارە نیو (صاع)یش دەكاتە نیوەی ئەوەندە.

<u>**مەسەلەی پازدەیەم:**</u> كە دەفەرموێ: ﴿ فَمَن تَطَوَّعَ خَيْرًا فَهُوَ خَيْرٌ لَّهُۥ ﴾، ﴿ فَمَن تَطَوَّعَ ﴾، واتە: هەركەسێك چاكەی زیادی كرد، ئەوە بۆ ئەو چاكترە، كە ئەمە هەم خواردن دانی زیاترە دەگرێتەوە، تۆ ئەگەر فیدیە بدەی خواردنی ژەمێك دەدەی بە نەدارێك، ئەگەر هی دووژەم بدەی دیارە باشترە، یاخود ئەگەر هی

---

١) سەرچاوەی پێشوو، هەمان بەرگ و لاپەڕە.

سێ ژەمان بدەی باشترە، ئەگەر خۆت لەو کەسانەبی، کە ڕۆژێ سێ ژەمان دەخۆن !! وە هەم ڕۆژووگرتنی سوننەتیش دەگرێتەوە، واتە: کە دوایی دەفەرموێ: ﴿ فَمَن تَطَوَّعَ خَيْرًا فَهُوَ خَيْرٌ لَّهُۥ ﴾، هەم (تطوّع)ی ڕۆژووو هەم (تطوع)ی خواردن دان، هەردووکیان دەگرێتەوە.

**مەسەلەی شازدەیەم:** ئەوە کە دەفەرموێ: ﴿ وَأَن تَصُومُواْ خَيْرٌ لَّكُمْ ﴾، ئەمە گشتی یە نەك مەبەست پێ نەخۆش و ڕێبوار بێ، چونکە ئەگەر مەبەست پێی نەخۆش و ڕێبوار بێ، واتە: ئەگەر بشمرن هەر واباشە بەڕۆژوو بن ! کە بە تەئکید مەبەست ئەوە نیە، چونکە زانایان لەسەر ئەوە یەك دەنگن، کە نەخۆشێك بترسێ بەهۆی بەڕۆژووبوونەوە نەخۆشییەکەی خراپتری بکات و بەرەو مەرگی بەرێ، حەرامە بەڕۆژووبێ، وە ڕێبوارێك کە ئێشەکەی وابێت بۆی نەکرێ ڕۆژوو بگرێ، حەرامە بەڕۆژوو بێ، کەواتە: ئایا لێرەدا مەبەست چییە لە: ﴿ وَأَن تَصُومُواْ خَيْرٌ لَّكُمْ ﴾؟! وەڵامەکە ئەوەیە کە: خوا ﷻ دەفەرموێ: ڕۆژووگرتنتان چاکترە مادام خاوەن عوزر نەبن، یانی: ڕۆژووگرتن زۆر چاکترە بۆ ئێوە کە بەبێ عوزر ڕۆژوو نەخۆن، ئەوە مەبەستەکەیە، وە ئەمە شتێکی وردەو ئەگەر بەجۆرێکی دی لێکی بدەیەوە بڵێی: ڕێبوارو نەخۆشیش هەر بەڕۆژووبن باشترە، لەگەڵ ئەوەی دیکە دژ دەوەستێتەوەو پێچەوانەی عەقڵ و واقیع و ڕووحی شەریعەتیشە.

**مەسەلەی حەڤدەیەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ شَهْرُ رَمَضَانَ ٱلَّذِىٓ أُنزِلَ فِيهِ ٱلْقُرْءَانُ ﴾، لێرەدا ئاوا دەفەرموێ و لە سوورەتی (الدخان)یشدا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّآ أَنزَلْنَٰهُ فِى لَيْلَةٍ مُّبَٰرَكَةٍ ۚ إِنَّا كُنَّا مُنذِرِينَ ﴿٣﴾ ﴾، وە لە سوورەتی (القدر)یشدا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّآ أَنزَلْنَٰهُ فِى لَيْلَةِ ٱلْقَدْرِ ﴿١﴾ ﴾، ئەمانە هەموویان یەکن: قورئان لە مانگی ڕەمەزاندا هاتە خوارێ، لە شەوی قەدردا، ئەو شەوەش شەوێکی موبارەکە.

**مەسەلەی هەژدەیەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ هُدًى لِّلنَّاسِ وَبَيِّنَٰتٍ مِّنَ ٱلْهُدَىٰ وَٱلْفُرْقَانِ ﴾ دووجار ﴿ هُدًى ﴾ دووبارە بۆتەوە، بۆچی؟ زانایان چەند وەڵامێکیان داونەوە، گرنگترینیان دووانن:

١- هەندێك دەڵێن: ﴿ هُدًى لِّلنَّاسِ ﴾، واتە: ئەو ڕێنمایییە بۆ خەڵکە، دوایی کە دەفەرموێ: ﴿ وَبَيِّنَٰتٍ مِّنَ ٱلْهُدَىٰ وَٱلْفُرْقَانِ ﴾، وە کۆمەڵێك ڕۆشنکەرەوە لە ڕێنمایی خواو لە جیاکەرەوە، ئەوەی یەکەمیان مەبەست پێی هیدایەتە بەگشتی، ئەویدیکە مەبەست پێی هیدایەتە لەڕووی شەریعەتەوەو لەڕووی یاساو حوکمەکانەوە.

٢- هەندێکیش دەڵێن: هیدایەتی یەکەم مەبەست پێی قوڕئانە، ئەویدیکە کە دەفەرموێ: ﴿ وَبَيِّنَٰتٍ مِّنَ ٱلْهُدَىٰ وَٱلْفُرْقَانِ ﴾، واتە: چەند شتێکی ڕۆشن لە هیدایەتو لە فورقان، هیدایەتو فورقانێك کە خوا لە تەوڕاتو ئینجیلدا ناردوونیە خوارێ، بۆچی؟ چونکە خوا ﷻ لە سەرەتای سووڕەتی (آل عمران)دا دەفەرموێ: ﴿ نَزَّلَ عَلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ بِٱلْحَقِّ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ وَأَنزَلَ ٱلتَّوْرَىٰةَ وَٱلْإِنجِيلَ ۝ مِن قَبْلُ هُدًى لِّلنَّاسِ وَأَنزَلَ ٱلْفُرْقَانَ ... ۝ ﴾ آل عمران، کەواتە: تەوڕات هیدایەتی تێدابوو بۆ خەڵك، (ئینجیل)یش فورقانی تێدابوو، قوڕئانیش هیدایەتو فورقانی (تەوڕات)و (ئینجیل)یشی گرتۆتە نێوخۆی، جگە لەو هیدایەتە تایبەتییەی کە خوا بەس لە قوڕئاندا ناردوویەتی.

**مەسەلەی نۆزدەیەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ فَمَن شَهِدَ مِنكُمُ ٱلشَّهْرَ ﴾ (شَهِدَ أي: حَضَرَ) لێرەدا (شَهِدَ) بەمانای: (رأى) بینی، نایەت، چونکە مانگ (شهر) نابینرێ، کەواتە: (فَمَنْ حَضَرَ مِنكُمُ الشهرَ فَلْيَصُمْهُ)، واتە: هەرکامێك لە ئێوە لەو مانگە ڕەمەزانەدا لەماڵی خۆی بوو، بابیگرێ، دەشگونجێ مەبەست لە (شَهِدَ) (بینی) بێ، بەڵام بینینی عەقڵ، واتە: هەرکەس بزانێ کە مانگی

ڕەمەزانە، با بەڕۆژووبێ، کەواتە: ﴿ فَمَن شَهِدَ مِنكُمُ ٱلشَّهۡرَ ﴾، یانی: هەرکامێك زانی، بە چاوی عەقڵ بینی، کە ڕەمەزانەو بۆی چەسپاو بوو، با بەڕۆژوو بێ.

**مەسەلەی بیستەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ فَمَن شَهِدَ مِنكُمُ ٱلشَّهۡرَ فَلۡيَصُمۡهُۖ ﴾ پێغەمبەر ﷺ ئەوەی ڕوونکردۆتەوە، چونکە پێغەمبەری خوا ڕوونکەرەوە (مُبـيِّن)ی قورئانە: ﴿ وَأَنزَلۡنَآ إِلَيۡكَ ٱلذِّكۡرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيۡهِمۡ وَلَعَلَّهُمۡ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٤٤﴾ ﴾ النحل، واتە: قورئانمان بۆ لای تۆ ناردۆتە خوار، تاکو ئەوەی بۆ خەڵکی نێرراوەتە خوارێ تۆ بۆیان ڕوونبکەیەوە، چۆن دەزانین کە ئەوە ڕەمەزانە؟ پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: {(صُومُوا لِرُؤْيَتِهِ وَأَفطِروا لِرُؤْيَتِهِ، فإنْ غُمِّيَ عَلَيْكُم فَأكْمِلُوا العِدَّة) (رَوَاهُ مالك برقم: (٦٤٧)، وَالبُخَارِيُّ برقم: (١٩٠٩)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٢٥١١)، وَالنَّسَائِيُّ برقم: (٢١١٦)، عَنْ أبي هُرَيرَةَ رضي الله عنه}، واتە: بەڕۆژووبن لە کاتی بینینی مانگی یەك شەوە (هلال)ی ڕەمەزاندا، وەبیشکێنن، دیسان لە کاتی بینینی مانگی یەك شەوە (هلال)ی شەووالدا (یانی: بەڕۆژووبن ئەگەر زانیتان ئەوە مانگی نوێی ڕەمەزانە، وە بیشکێنن ئەگەر زانیتان ڕەمەزان بەسەرچووەو، ئەوە مانگی نوێی شەووالە، جا ئەگەر مانگتان نەبینیو لێتان پەنهان بوو، (هەور بوو، یان باران بوو، یان لە بەرهەر هۆیەکی دیکە) ئەوە ژمارەکە تەواوبکەن، {یانی ئەگەر مانگتان نەبینی، ئەوا ژمارەکە تەواوبکەن، (٣٠) یان (٢٩)، ئەگەر بەپێی حیساباتی فەلەکیی دەرکەوت، کە ئەو مانگە (٢٩)یە}.

**مەسەلەی بیستو یەکەم:** جاری وا هەیە مانگ (٢٩)یەو مەرج نیە کە مانگ تەنیا دەبێ (٣٠) بێ، بەڵکو جاری وا هەیە مانگ (٢٩)یە ، وەك پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {(إنَّ الشهرَ يَكُونُ تِسعَةً وَعِشرينَ يَوْمَاً) (رَوَاهُ البُخَارِيُّ برقم: (١٩١٠)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٢٥١٩)، عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ رَضِيَ اللهُ عَنهَا}، واتە: مانگ جاری وایە بیستو نۆ ڕۆژ دەبێت.

**مەسەلەی بیستو دووەم:** ئایا بینینی مانگ دووشایەدی دەوێ، یان یەك ؟

زانایان هەموو لە سەرئەوە یەك دەنگن، هەركاتێ دوو شایەدی دادگەر شایەدییاندا كە مانگیان بینیوە (واتە: مانگی یەك شەوەی ڕەمەزان) دەبێ ڕۆژەكەی بكەنە ڕەمەزان، بەڵام ئەگەر تەنیا یەك شایەد بوو، زانایان لەوبارەوە ڕاجیاییان هەیە: هەرچی (مالك)ە دەڵێ: دەبێ دووشایەد هەر هەبن، بەڵام (أبوحنیفة والشافعي)و زۆربەی زانایان دەڵێن: یەك شایەد بەسە، بەڵام بەمەرجێك شایەدێكی دادگەرو متمانەپێكراو بێت[1]، بە بەڵگەی ئەم فەرموودەیە: {(عَنْ ابنُ عُمَرَ رضي الله عنه تَراءى النَّاسُ الهِلَالَ فَأَخْبَرتُ رَسولَ اللهِ ﷺ أنِّي رَأيتُهُ، فَصَامَ وَأمَرَ النَّاسَ بِصيَامِهِ) (رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ برقم: (٢٣٤٢)، وَالدَارمي برقم: (١٦٤٣)، وَصَحَّحَهُ الألباني في سُنَن أَبُو دَاوُدَ)، واتە: عەبدوڵڵای كوڕی عومەر خوا لێیان ڕازی بێ دەڵێ: خەڵك تەماشای هیلالیان دەكرد (مانگی یەك شەوە) منیش هەواڵم بە پێغەمبەردا ﷺ كە بینیومە، پێغەمبەریش ﷺ بۆخۆشی بەڕۆژوو بوو، فەرمانیشی كرد بە خەڵك كە بەڕۆژوو بن. دیارە لە شتێكیشدا كە فەرمایشتی پێغەمبەر ﷺ هەبوو بواری ڕاجیایی نیە، بەڵام وا دیارە (مالك) ئەم فەرمایشتەی بۆ ساغ نەبۆتەوە، كە ئەوە هی پێغەمبەرە ﷺ، ئەگەرنا هیچ زانایەك نیە بزانێ كە پێغەمبەر ﷺ شتێكی فەرمووەو ئەویش ڕایەكی دیكەی هەبێ، بەڵام دیارە لەلای ساغ نەبۆتەوە كە ئەوە فەرموودەیە، یان ئەو فەرموودەیەی هەر پێ نەگەیشتوە.

**مەسەلەی بیستو سێیەم:** دیتنی مانگ لەلای زۆربەی زانایان بۆ شوێنانی لەیەك نزیك، لە یەكێكیان ببینرێ، لە هەموویان دەبێ بیكەنە ڕەمەزان، بەڵام بۆ شوێنانی لەیەك دوور حوكمەكەی جیایە، بە واتایەكی دی:

١- زۆربەی زانایان دەڵێن: (اختلاف المطالع)، واتە: جیاوازیی ئەو شوێنانەی كە مانگیان لێ هەڵدێت، دەبێتە هۆی ئەوە كە ڕەمەزان لە شوێنێك بێ‌و، لە

---

١) هەمان سەرچاوەو بەرگ، ص: (٥٢٢، ٥٢٣) .

شوێنەکانی دیکە نەبێ.

٢- بەڵام (أبو حنيفة) دەڵێ: نەخێر لە هەر شوێنێك مانگ ببینرێ، مسوڵمانان لە هەر شوێنێکی دنیابن دەبێ بەڕۆژووبن[1].

بەڵام بەڕاستی ڕای زۆربەی زانایان بەهێزترەو ئەویش زیاتر لەگەڵ زانستی گەردووناسییدا دەگونجێ، چونکە دەگونجێ مانگ لە شوێنێك ببینرێو لە شوێنێکی دی نەبینرێو، ئەمە ئێستا بۆتە ڕاستییەکی زانستی.

**مەسەلەی بیست وچوارەم:** خوا ﷻ دووجار دەفەرموێ: ﴿ فَمَن كَانَ مِنكُم مَّرِيضًا أَوْ عَلَىٰ سَفَرٍ فَعِدَّةٌ مِّنْ أَيَّامٍ أُخَرَ ﴾، ﴿ وَمَن كَانَ مَرِيضًا أَوْ عَلَىٰ سَفَرٍ فَعِدَّةٌ مِّنْ أَيَّامٍ أُخَرَ ﴾، لە دوو ئایەتدا ئەم ڕستە لەگەڵ جیاوازییەکی کەمدا دووبارە بۆتەوە، توێژەرەوانی قورئان زۆریان قسە لێکردوە، بەڵام من هەربە کورتیی دەڵێم: لەڕاستیدا ئەو دووبارە بوونەوەیە لەبەر ئەوەیە کە سیاقەکە دەیخوازێ، خوا ﷻ پێشێ باسی کردوە، دوایی کە دێتە سەرباسی مانگی ڕەمەزانیش جارێکی دیکە باسی کردۆتەوەو سیاقی قسەکان دەیخوازێ، کە ئەم ڕستە موبارەکە دووبارە بێتەوە، وە بە تەئکید گرنگیشە کە خوا ﷻ ئەو مۆڵەتە دەدا بە بەندەکانیو ڕایدەگەیەنێ، کە ئەگەر نەخۆش بوون، یان بە سەفەر چوون، بۆتان هەیە بەڕۆژوو نەبن.

**مەسەلەی بیستو پێنجەم:** کە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ يُرِيدُ اللَّهُ بِكُمُ الْيُسْرَ وَلَا يُرِيدُ بِكُمُ ﴾، خوا ئاسانیی بۆ ئێوە دەوێو زەحمەتی بۆ ئێوە ناوێ، بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە ئەوەی پێشتر فەرمووی: ﴿ وَعَلَى الَّذِينَ يُطِيقُونَهُ فِدْيَةٌ طَعَامُ مِسْكِينٍ ﴾، (مَنْسوخ) نیە، بۆچی؟ چونکە خوا لێرە منەت لەسەر

---

١) سەرچاوەی پێشوو، ج: (٢)، ص: (٥٢٣، ٥٢٤).

مسوڵمانان دەکاتو دەفەرموێ: خوا ئاسانیی بۆ ئێوە دەوێو زەحمەتی ناوێ، جا دیارە ئەوەی پێشێ ئاسانتر بووە، کە مرۆڤ بۆی هەبێت بەڕۆژوو نەبێ، چونکە هەندێك گوتوویانە: مسوڵمانان لە سەرەتاوە بۆیان هەبووە بەڕۆژووبن و، بۆشیان هەبووە بەڕۆژوو نەبن، بەڵام دوایی خوا (نَسْخ)ی کردۆتەوە، بەڵام ئەگەر ئەوە وابووایە، خوا لێرەدا باسی ئاسانیی نەدەکرد چونکە دوایی کە فەرموویەتی دەبێ هەر بەڕۆژووبن، ئەوە لەڕاستیدا لەگەڵ ئەوە ناگونجێ کە ئەو ڕستەیە (مَنْسوخ)بێ، کەواتە: ئەو حوکمەی کە بەشێك لە ئاسانیی تێدا بەرجەستە دەبێ، کە بریتییە لە بەڕۆژوونەبوونی بابایەك کە زۆر بە زەحمەت نەبێ ڕۆژووی بۆ ناگیرێو فیدیە دانی، ناگونجێ نەسخ کرابێتەوە.

**مەسەلەی بیستو شەشەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ وَلِتُكْمِلُوا۟ ٱلْعِدَّةَ وَلِتُكَبِّرُوا۟ ٱللَّهَ عَلَىٰ مَا هَدَىٰكُمْ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴾، باسی سێ شتان دەکات:

١- وە با ژمارەکە تەواو بکەن.
٢- وە خوا بە گەورە بگرن.
٣- وە سوپاسگوزاریی بکەن.

١/ ژمارەکان تەواو بکەن، واتە: مانگی ڕەمەزان بەتەواویی بگرن، ئەگەر (٢٩)یە (٢٩)ی بگرن، ئەگەر (٣٠)یە (٣٠)ی بگرن، مانایەکی دیکەی ئەوەیە، کە ئەوانەی ڕۆژوویان خواردوە، با چەند ڕۆژیان خواردوون ئەوەندە بگرنەوەو مانگەکە تەواوبکەن، جا (٢٩) بوو، یان (٣٠) بوو.

٢/ خوا بەگەورە بگرن ﴿ وَلِتُكَبِّرُوا۟ ٱللَّهَ عَلَىٰ مَا هَدَىٰكُمْ ﴾، دەگونجێ مەبەست پێی بە گەورەگرتن بێ بەگشتی، ئینسانی مسوڵمان دەبێ هەمیشە خوا بەگەورە بگرێو بڵێ: (الله أكبر) لە دڵی دابێو بەزمان بیڵێ، وە دەشگونجێ مەبەست پێی (الله أكبر)ەکانی جەژن بێت، کە لەوبارەوە ئەو فەرموودەیە هەیە: {(عَنْ ابنُ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا، أنَّ رَسولَ اللهِ ﷺ كَانَ

يُكَبِّرُ يَوْمَ الفِطْرِ مِنْ حِينَ يَخرُجُ مِن بَيْتِهِ حَتَّى يَأَتي المُصَلَّى) (رَوَاهُ الدارقُطني في كتاب العيدين برقم: (٦)}، واتە: عەبدوڵلای كوڕی عومەڕ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆژی جەژنی ڕەمەزان لەوكاتەوە، كە لەماڵ دەردەچوو هەتاكو دەگەیشتە نوێژگە (المُصَلَّى) (ئەوان لە مزگەوت نوێژیان نەكردوەو لە دەشتێك كردوویانە)، (اللّٰه أكبر)ی دەكرد.

٣/ وە مەبەست لە سوپاسگوزارییش، سوپاسگوزارییە لە بەرانبەر نیعمەتەكانی خوادا، كە خوای پەروەردگار ئاسانكاریی بۆكردووین، ئەگەر نەخۆش بووین‌و لە سەفەر بووین، وە ئەگەر پیرو پەككەوتە، یاخود نەخۆشییەكی بەردەوام بووین بۆمان هەیە نەیگرین، وە ئەو (ل)لامەش كە دەفەرموێ: ﴿ وَلِتُكۡمِلُواْ ٱلۡعِدَّةَ وَلِتُكَبِّرُواْ ٱللَّهَ عَلَىٰ مَا هَدَىٰكُمۡ وَلَعَلَّكُمۡ تَشۡكُرُونَ ﴾، واتە: خوا ئەم یاسایانەی داناوەو ئەوەی ڕابردووی باسكرد تاكو بتوانن مانگی ڕەمەزان تەواوبكەن، وە سەرەنجام خوا بەگەورە بگرن‌و سوپاسگوزاریی بۆ بكەن.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی سی و هەشتەمین

## پێناسەی ئەم دەرسە

لەم دەرسەدا هەر لە خزمەتی سوورەتی (البقرة)دا دەبین، لە ئایەتی ژمارە (١٨٦ تاكو ١٨٩)، خوا ﷻ لەم چوار ئایەتە بە پێزەدا باسی نزاو پاڕانەوە دەكات، وە باسی چەند حوكمێك دەكات دەربارەی ڕۆژووگرتن، وە ڕۆژووەوانان لە شەودا چۆن هەڵسوكەوت لەگەڵ هاوسەرەكانیاندا بكەن؟ هەروەها باسی كاتی خواردن و خواردنەوە دەكات، پاشان خوای كاربەجێ فەرمان دەكات بە مسوڵمانان كە ماڵی یەكدی بە ناهەق و بەشێوەی ناڕەوا نەخۆن، دوایی دەربارەی مانگی تازەبووەوە، كە پرسیار كراوە لە پێغەمبەر ﷺ خوای پەروەردگار بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: وەڵامی مسوڵمانان بداتەوە، كە دەركەوتنی مانگ لە قۆناغە جیاجیاكانی دەركەوتنیدا، یەكێك لە حیكمەت و سوودەكانی زانینی كاتەكانی بۆنەكان و جێبەجێكردنی خواپەرستییەكانی حەجە.

﴿ وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِي عَنِّي فَإِنِّي قَرِيبٌ ۖ أُجِيبُ دَعْوَةَ الدَّاعِ إِذَا دَعَانِ ۖ فَلْيَسْتَجِيبُوا لِي وَلْيُؤْمِنُوا بِي لَعَلَّهُمْ يَرْشُدُونَ ﴿١٨٦﴾ أُحِلَّ لَكُمْ لَيْلَةَ الصِّيَامِ الرَّفَثُ إِلَىٰ نِسَائِكُمْ ۚ هُنَّ لِبَاسٌ لَّكُمْ وَأَنتُمْ لِبَاسٌ لَّهُنَّ ۗ عَلِمَ اللَّهُ أَنَّكُمْ كُنتُمْ تَخْتَانُونَ أَنفُسَكُمْ فَتَابَ عَلَيْكُمْ وَعَفَا عَنكُمْ ۖ فَالْآنَ بَاشِرُوهُنَّ وَابْتَغُوا مَا كَتَبَ اللَّهُ لَكُمْ ۚ وَكُلُوا وَاشْرَبُوا حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَكُمُ الْخَيْطُ الْأَبْيَضُ مِنَ الْخَيْطِ الْأَسْوَدِ مِنَ الْفَجْرِ ۖ ثُمَّ أَتِمُّوا الصِّيَامَ إِلَى اللَّيْلِ ۚ وَلَا تُبَاشِرُوهُنَّ وَأَنتُمْ عَاكِفُونَ فِي الْمَسَاجِدِ ۗ تِلْكَ حُدُودُ اللَّهِ فَلَا تَقْرَبُوهَا ۗ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ اللَّهُ آيَاتِهِ لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ ﴿١٨٧﴾ وَلَا تَأْكُلُوا أَمْوَالَكُم بَيْنَكُم بِالْبَاطِلِ وَتُدْلُوا بِهَا إِلَى الْحُكَّامِ

لِتَأْكُلُوا۟ فَرِيقًا مِّنْ أَمْوَٰلِ ٱلنَّاسِ بِٱلْإِثْمِ وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿١٨٨﴾ يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْأَهِلَّةِ ۖ قُلْ هِىَ مَوَٰقِيتُ لِلنَّاسِ وَٱلْحَجِّ ۗ وَلَيْسَ ٱلْبِرُّ بِأَن تَأْتُوا۟ ٱلْبُيُوتَ مِن ظُهُورِهَا وَلَـٰكِنَّ ٱلْبِرَّ مَنِ ٱتَّقَىٰ ۗ وَأْتُوا۟ ٱلْبُيُوتَ مِنْ أَبْوَٰبِهَا ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿١٨٩﴾ ﴾.

## مانای وشە بە وشەی ئایەتەکان

((وە هەر کاتێك بەندەکانم لەبارەی منەوە پرسیاریان لێکردی (واتە: لەتۆ ئەی موحەممەد ﷺ) ئەوە (بابزانن کە) من نزیکم، وەڵامی داواکەر دەدەمەوە، هەرکات لێم بپاڕێتەوە، دەجا با ئەوانیش بە دەنگمەوە بێن‌و بڕوام پێ بێنن، بەڵکو سەر ڕاست بن ﴿١٨٦﴾ لە شەوانی ڕۆژووگرتندا جوتبوون لەگەڵ ژنەکانتان بۆ ڕەوا کراوە، ئەوان پۆشاکی ئێوەن‌و ئێوەش پۆشاکی ئەوانن، خوا دەیزانی کە ئێوە پێشتر لەگەڵ خۆتاندا ناپاکیتان دەکرد، بەڵام گەڕانەوەتانی وەرگرت‌و لێتان بورد، جا ئێستا بچنە لایان با مەبەستیشتان ئەوەبێ، کە خوا بۆی بڕیار داون (لە منداڵ‌و جێبەجێکردنی مافی ژن)، وە بخۆن‌و بخۆنەوە هەتا دەزووی سپی‌و دەزووی ڕەشی بەرەبەیانتان بۆ لە یەك جیادەبنەوە، ئنجا ڕۆژووگرتنەکەتان هەتا شەوێ تەواو بکەن، وە لەحاڵێکدا کە لە مزگەوتێدا لە ئیعتیکافدان مەچنە لایان، ئەوانە سنوورەکانی خوان توخنیان مەکەون، ئاوا خوا ئایەتەکانی خۆی بۆ خەڵکی ڕۆشن دەکاتەوە، بەهیوای ئەوە کە پارێز بکەن ﴿١٨٧﴾ وە سامانی خۆتان لەنێوخۆتاندا بە نارەوایی مەخۆن‌و (وەك بەرتیلیش) مەیدەنە دادوەرەکان تاکو بەشێك لە ماڵی خەڵکی تاوانبارانە بخۆن، لە حاڵێکدا کە دەشزانن (حەرامە) ﴿١٨٨﴾ لەبارەی مانگە نوێبووەوەکانەوە لێت دەپرسن، بڵێ: ئەوانە بۆ (زانینی ڕێکخستنی) کاتەکانی کاروباری خەڵك‌و (کاتی) حەج کردنن، وە چاکەکاریی ئەوەنیە کە لە پشتەوە ڕا بچنە ماڵەکانتان، بەڵکو چاکەکاریی سیفەتی کەسێکە پارێز بکات، وە لە دەرگاکانەوە بچنە ماڵەکانتانەوەو پارێزیش لە خوا بکەن بەڵکو سەرفرازبن ﴿١٨٩﴾ )).

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(سَأَلَكَ ): (السُّؤالُ: استدْعَاءُ مَعْرِفَةٍ، أو ما يُؤدِّي إلى المَعْرِفَةِ، وَاستدْعَاءُ مَالٍ، أو ما يُؤدِّي إلى المالِ) پرسیارو داواکردن پەیداکردنی زانست، یان ئەوەی مایەی زانستە، وە پەیداکردنی ماڵو سامان، یان شتێکە کە مایەی پەیداکردنی ماڵو سامانە.

(دَعْوَةَ ): (الدُعَاءُ كَالنِدَاءِ. والدُعَاء إلى الشيء الحَثُّ عَلَيْهِ) وشەی: (دَعْوَة، دُعَاء، نِدَاء) مانایان لێك نزیکە، تەنیا ئەوەندە هەیە، کە ئەگەر (نِدَاء)بێ (یا)ی دەچێتە سەر، وەك: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ﴾، بەڵام (دُعَاء) یەکسەر دەست پێدەکات، وەك: ﴿ ...رَبِّ ٱغْفِرْ لِى ...﴿٣٥﴾ ﴾ ص، وە (الدُعَاءُ إلى الشَّيءِ الحَثُّ عَلَيهِ)، واتە: دووعا بۆ شتێك ئەوەیە کە جەختی لەسەر بکرێتەوە، وەك پێغەمبەر (یوسف) ﷺ دەفەرموێ: ﴿ قَالَ رَبِّ ٱلسِّجْنُ أَحَبُّ إِلَىَّ مِمَّا يَدْعُونَنِىٓ إِلَيْهِ ... ﴿٣٣﴾ ﴾ یوسف، واتە: پەروەردگارم من سجنم لەلا خۆشەویستترە لەوەی کە منی بۆ بانگ دەکەن. (واتە، منی بۆ هاندەدەنو جەختم لەسەر دەکەنەوە کە بیکەم، کە بریتی بوو لە داوێن پیسیی کردن لەگەڵ هاوسەری مەلیکدا).

(فَلْيَسْتَجِيبُوا۟ لِى ): (الإستجَابَةُ: هيَ كَالإجَابَة)، (إستجابة) وەك (إجَابَة) وایە، واتە: با وەڵامم بدەنەوە بە دەنگمەوە بێن.

(يَرْشُدُونَ ): (الرَّشَدُ والرُّشْدُ: خِلاَفُ الغَيِّ، ويُستعمَلُ استعْمَالَ الهِدَايَة) هەردوو وشەی (رَشَدُ و رُشْدُ) پێچەوانەی (غَيّ)ن، وەك هیدایەت بەکاردێن، واتە: سەر ڕاستیی، یاخود ڕێگای ڕاست گرتن، هەروەك چۆن (غِوَايَة أو غَي) یانی: سەرگەردانیو سەرلێشێوان.

**(ٱلرَّفَثُ)**: (الرَّفَثُ: كَلامٌ مُتَضَمِّنٌ لِمَا يُستقبَحُ ذِكرُهُ مِنَ ذكرِ الجِمَاعِ، ودَوَاعيهِ، وجُعِلَ كِنايَةً مِنَ الجِمَاعِ)، واتە: (الرَّفَثُ) وشەیەکە هەموو ئەو شتانە دەگرێتە نێوخۆی کە ناشیرینە باس بکرێن، لە باسی جووتبوونی ئافرەتو پیاو، وە ئەو شتانەی کە وەك پێشەکی وان بۆ جووتبوون، وە کراوەتە (كِنايَةً) لە جیاتی جووتبوون. (زَجَّاج)، دەڵێ: (الرَّفَثُ: كَلِمةٌ جَامِعَةٌ لِكُلِّ مَا يُريدُ الرَجُلُ مِنْ امْرَأتِهِ)، واتە: (الرَّفَثُ) وشەیەکی کۆکەرەوەیە بۆ هەموو ئەو شتانەی کە پیاو لە خێزانی خۆی دەیەوێن.

**(تَخۡتَانُونَ)**: (الخِيانَةُ والنِّفَاقُ: وَاحِدٌ، إلاَّ أنَّ الخِيَانةَ تُقَالُ اعْتِبَاراً بالعَهْدِ وَالأمَانةَ، والنِّفَاقُ يُقَالُ اعْتِبَاراً بالدِّين)، واتە: وشەی (الخِيانَةُ والنِّفَاقُ) وەك یەکن و یەك شتن، ئەوەندە هەیە خیانەت لە بواری پەیمان و ئەمانەتدا بەکاردێ، (وەك ئەوەی کەسێك ناپاکیی دەکات لەگەڵ پەیمان و ئەمانەت) بەڵام نیفاق، لەڕووی دیندارییەوە دەگوترێ، بەڵام وشەی (تَخْتَانُون)، واتە: دەتانەوێ خیانەت بکەن. (الإختِيانُ: مُرَاوَدَةُ الخِيانةِ، وَهِي تَحَرُّكُ شهوَةِ الإنسانِ لتَحَرِّي الخِيَانَةِ)، واتە: (الإختیانُ) بریتییە لە هەوڵدان بۆ خیانەتکردن و جووڵانی ئارەزووی ئینسان بەرەو ناپاکیی.

**(بَٰشِرُوهُنَّ)**: (المُباشَرَةُ: الإفضَاءُ بالبَشرتينِ، كِنَايَةً عَنِ الجِمَاعِ)، واتە: (مُباشَرَةُ) بریتییە لەوەی کە دوو پێست بەریەککەون، کە لێرەدا مەبەست پێی جووتبوونی ژن و مێردە.

**(ٱلۡخَيۡطُ ٱلۡأَبۡيَضُ)**: (الخَيْطُ جمعُهُ خُيُوطٌ، يُقَالُ خِطْتُ الثَّوبَ أخيطُهُ خَياطةً. والخِياطُ: الإبرة التي يُخاط بها، إنفصال بَياضُ النَّهارِ مِنَ سوادِ اللَّيلِ)، وشەی (الخَيط)، واتە: دەزوو، کۆیەکەی بریتییە لە (خُيُوطٌ) دەگوترێ: (خِطْتُ الثَّوبَ) واتە پۆشاکەکەم دروو، (الخَيَّاط) ئەو کەسەیە کە دەیدوورێ، بەڵام لێرە مەبەست لە (الخَيط) دەزووی بەرەبەیانە کە سپی یە، لەگەڵ ڕۆیشتنی

شەوو هاتنی ڕۆژدا، کە وەك دوو دەزوو ڕێك بەدەم یەکەوەن، پاشان وردە وردە لە یەك جیادەبنەوە.

(ٱلْفَجْرِ): (الفَجْرُ: شَقُّ الشَيء وَاسِعاً)، وشەی (فَجْر) بریتیە لە لەتکردنێکی فراوان، کە لێرەدا مەبەست پێی شێوەی بەرەبەیانە.

(عَٰكِفُونَ): (العُكُوف: الإقبالُ عَلَى الشَيءِ ومُلازمَتُهُ عَلَى سَبِيلِ التَعْظِيم، وَفي الشَّرْعِ هُوَ الإحتِباسُ في المَسْجِدِ عَلَى سَبِيلِ القُربَةِ) وشەی: (عُكُوف) لە زمانی عەرەبیدا بریتیە لەوەی کە ئینسان ڕوو لە شتێك بکات و بمێنێتەوە لەسەر شێوەی بە گەورەگرتن، وە لە زاراوی شەرعدا (عُكُوف) ئەوەیە کە ئینسان خۆی لە مزگەوت بهێڵێتەوە، بە شێوەی لە خوا نزیکبوونەوەو بە مەبەستی لە خوا نزیکبوونەوە.

(ٱلْمَسَٰجِدِ): (المَساجِد، جَمْعُ المَسْجِدِ، المَسْجِدُ: مَوضِعُ الصَلاةِ اعتباراً بالسُجُود)، (مَسْجد) بریتیە لە هەر شوێنێك کە نوێژی لێ دەکرێ، چونکە کڕنووشی تێدا دەبردرێ.

(حُدُودُ ٱللَّهِ): (حدُود) کۆی (حَدّ)ە، (الحَدّ: الحَاجِزُ بَيْنَ الشَّيئَين)، (حدّ) سنووری نێوان دوو شتانە (يَمنَعُ اختلاط أحَدِهِمَا بالآخر) ناهێڵێ ئەو دوو شتانە تێکەڵ بن. وە لە زاراوەی شەرعدا بۆیە ناو لە سزا شەرعییەکان نراوە (حدود)، چونکە ئینسان دەگێڕنەوە لەوەی کە تووشی ئەو گوناحە ببێ، لەبەر ئەوەی کە دەزانێ سزا دەدرێ لێی دەپرنگێتەوە.

(وَتُدْلُواْ بِهَآ): (أدْلى)، واتە: شۆڕی کردەوە، کابرا دۆلکە لە بیردا شۆڕدەکاتەوە، دایدەهێڵێ پێی دەگوترێ: (أدلى)، کە لێرەدا مەبەست گەیاندنی بەرتیلە بە دادوەرانی ستەمکار.

(ٱلْحُكَّامِ): (الحُكّامُ: جَمعُ الحاكم: مَنْ يَحكُمَ بَيْنَ النَّاسِ) کۆی (حاکم)، واتە: هەرکەسێك کە دادوەریی لەنێوان خەڵکیدا بکات، بەڵام (حَكَم) دەڵێ:

(الحَكَمَ: المتخصّصُ بذَلِكَ فَهُوَ أَبلَغ)، (حَكَمْ): ئەوەیە كە پسپۆڕبێ لە دادوەریی نێوانی خەڵكدا، بەڵام حاكم هەركەسێكە با پسپۆڕیش نەبێ.

(ٱلْأَهِلَّةِ): (جَمعُ هِلال، وَهُوَ القَمر في أوّل اللّيلَة والثانية ثُمّ يُقالُ لَهُ القَمَر) (الأَهلّة) كۆی (هلال)ە، (هلال)، واتە: مانگی یەك شەو، یان دوو شەو، لەدوای دوو شەوەوە پێی دەگوترێ (قمر) واتە: مانگ.

(مَوَاقِيتُ): (وَهوَ الوَقتُ المَفروضُ المَضْروبَ لِلشّيءِ، والوَعدُ الّذي يُعمَلُ لَهُ وَقتٌ، وَقد يُقالُ: (مِيقات) للمَكَانِ الّذي يُجعَلُ وَقْتاً لِلشّيءِ، كَمِيقاتِ الحَج) (مَوَاقِيت) كۆی (میقات)ە، ئەویش بریتیە لەو كاتەی كە دیاری كراوە بۆ شتێك، یاخود بەڵێنێك كە دیاریكرابێ لە كاتێكی دیاریكراودا، هەروەها جاری وایە بۆ شوێنیش بەكاردێ، شوێنێك كە دیاری كراوە بۆ ئەوەی كارێكی تێدا ئەنجام بدرێ، وەك (میقات)ی حەج كە ئیحرامی تێدا دەبەسترێ.

## هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتەكان

١) هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو ئایەتەی، كە دەفەرمویَ: ﴿ وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِى عَنِّى فَإِنِّى قَرِيبٌ أُجِيبُ دَعْوَةَ ٱلدَّاعِ إِذَا دَعَانِ فَلْيَسْتَجِيبُوا۟ لِى وَلْيُؤْمِنُوا۟ بِى لَعَلَّهُمْ يَرْشُدُونَ ﴾، {(أخرَجَ ابْنُ جَرير الطّبَري، وَابْنُ أَبي حَاتم، وَابن مُردويَه، وأبو الشَيخ، وغيرهم مِن طُرُقٍ عَن جَرير بن عَبْدُ حُمَيد، عن عبدة السجستاني، عَن الصّلت بن حَكيم بن معَاوِيَة بن سيدة، عَن أبيه، عَن جدّهِ قَالَ: جَاءَ أَعرَابيٌ إلى النّبيّ ﷺ، فَقَالَ: أَقَرِيبٌ رَبّنَا فَنُنَاجِيهِ أَمْ بَعيدٌ فَنُنَادِيهِ؟ فَسَكَتَ عَنهُ، فَأَنْزَلَ اللهُ: ﴿ وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِى عَنِّى فَإِنِّى قَرِيبٌ ... ﴾)}، واتە: عەرەبێكی دەشتەكیی هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ گوتی: (ئەی پێغەمبەری خوا! ﷺ) ئایا پەروەردگارمان نزیكە هەتا وتوووێژو گفتوگۆی لەگەڵ بكەین، یاخود دوورە بۆ ئەوەی بانگی بكەین؟ ئەویش بێدەنگ بوو، ئنجا خوا ﷻ ئەم

ئایەتەی ناردە خوارەوە: ﴿ وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِي عَنِّي فَإِنِّي قَرِيبٌ .... ﴾.

٢) هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو ڕستەیەی کە دەفەرموێ: ﴿ أُحِلَّ لَكُمْ لَيْلَةَ الصِّيَامِ الرَّفَثُ إِلَىٰ نِسَآئِكُمْ ... ﴾، {(عَنِ البَرَاءِ رضي الله عنه، كَانَ أَصحَابُ النَّبيِّ ﷺ إِذَا كَانَ الرَّجُلُ صَائِمَاً، فَحَضَرَ الإِفطَارُ فنَامَ قَبلَ أَنْ يُفطِرَ، لَمْ يَأْكُل لَيلَتَهُ ولا يَوْمَهُ حَتَّى يُمسِيَ، وإِنَّ قَيسَ بنَ صِرمَةَ الأَنصَارِي كَانَ صَائِمَاً – وفي رواية كَانَ يَعمَلُ في النَخيلِ في النَّهارِ وَهُوَ صَائِمٌ – فَلَمَّا حَضَرَ الإِفطَارُ أَتَى امرَأَتَهُ فقَالَ لَهَا: أَعِندَكِ طَعَامٌ؟ قَالَتْ: لاَ، وَلَكِن أَنطَلِقُ فأَطلُبُ لَكَ، وَكَانَ يَومَهُ يَعمَلُ، فَغَلَبَتهُ عَينَاهُ فَجَاءَتهُ امرَأَتهُ، فَلَمَّا رَأَتْهُ قَالَتْ: خَيْبَةً لَكَ، فَلَمَّا انتَصَفَ النَّهَارُ غُشِيَ عَلَيهِ، فَذُكِرَ ذَلِكَ لِلنَّبيِّ ﷺ فَنَزَلَتْ هَذِهِ الآيَة ﴿ أُحِلَّ لَكُمْ لَيْلَةَ الصِّيَامِ الرَّفَثُ إِلَىٰ نِسَآئِكُمْ ... ﴾ ففَرِحُوا بِهَا فَرحَاً شَدِيدَاً، وَنَزَلَتْ ﴿ ... حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَكُمُ الْخَيْطُ الْأَبْيَضُ مِنَ الْخَيْطِ الْأَسْوَدِ ﴾)، (رَوَاهُ البُخَارِيُّ برقم: (١٩١٥)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٢٣١٤)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٢٩٦٨)}، واتە: بەڕاء خوا لێی ڕازی بێت دەڵێ: هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ ئەگەر یەکێکیان بەڕۆژوو بووایەو کاتی بەربانگ هاتبایەو خەوتبا، پێش ئەوەی بەربانگ بکاتەوە، بۆی نەبوو بخوات نە شەوەکەی نە ڕۆژەکەشی (واتە: سبەینێش) هەتا بەر بانگێکی دیکە، ئنجا قەیسی کوڕی صیرمەی ئەنصاری بەڕۆژوو بوو (لە ڕیوایەتێکدا دەڵێ: کاری کردوە لەنێو باغی دارخورماداو بەڕۆژووش بووە) کاتێ بەربانگ بووە چۆتە ماڵەوەو بە خێزانی گوتوە: خواردنت لایە بەربانگ بکەمەوە؟ ئەویش گوتوویەتی: نەخێر. بەڵام دەچم بۆت دێنم، جا لەبەر ئەوەی ئەو ڕۆژە کاری کردوە (دیارە ماندوو بووە) خەوی لێکەوتوە کە خێزانی هاتۆتەوە، گوتوویەتی: (خَيبَةً لَكَ) واتە: ماڵ وێران خۆت! (دیارە شەوەکەشی هیچ خواردنێکی نەخواردوەو ڕۆژەکەشی هیچی نەخواردوە) بۆیە کە گەیشتۆتە نیوەڕۆ لە هۆشی خۆی چووەو ئەوە بۆ پێغەمبەر ﷺ باسکراوە، خواش ئەم ئایەتەی ناردۆتە خوارەوە: ﴿ أُحِلَّ لَكُمْ لَيْلَةَ الصِّيَامِ الرَّفَثُ إِلَىٰ نِسَآئِكُمْ ... ﴾، وە

هاوەڵان زۆریـان دڵ پێ خۆشـبوو، دوایی خوا پەروەردگار ئـەم ئایەتەشی نـاردە خـوارەوە كـە دەفـەرموێ: ﴿ .... وَكُلُواْ وَاشْرَبُواْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَكُمُ الْخَيْطُ الْأَبْيَضُ مِنَ الْخَيْطِ الْأَسْوَدِ مِنَ الْفَجْرِ ﴾.

٣) هـۆی هاتنە خوارەوەی ئەو ڕستەیەی، كە دەفەرموێ: ﴿ عَلِمَ اللَّهُ أَنَّكُمْ كُنتُمْ تَخْتَانُونَ أَنفُسَكُمْ فَتَابَ عَلَيْكُمْ وَعَفَا عَنكُمْ ﴾، {(عَنِ الْبَرَاءِ ﷺ قَالَ: لَمَّا نَـزَلَ صَوْمُ رَمَضَانَ، كَانُوا لاَ يَقْرَبُونَ النِّسَاءَ رَمَضَانَ كُلَّهُ، وَكَانَ رِجَالٌ يَخُونُـونَ أَنفُـسَهُمْ، فَـأَنْزَلَ اللهُ: ﴿ عَلِمَ اللَّهُ أَنَّكُمْ كُنتُمْ تَخْتَانُونَ أَنفُسَكُمْ فَتَابَ عَلَيْكُمْ وَعَفَا عَنكُمْ ﴾ ) (رَوَاهُ الْبُخَـارِي بـرقم: (٤٥٠٨)}، واتـە: بـەڕاء خـوا لێی ڕازی بێ دەڵێ: كاتێـك ڕۆژووگرتنی مانگی ڕەمەزان هاتە خوارێ، هاوەڵانی پێغەمبـەر ﷺ عادەتیـان وابـوو نەدەچوونـــە لای خێزانەكانیـــان لـە مـانگی ڕەمەزانـدا {دیارە پێغەمبەر ﷺ پێی گوتوونو لە ڕیوایـەتی دیكـەدا هاتوە، كە پێش نوێـژی خـەوتنان بۆیـان نـەبووە، واتـە: ماوەیـەكی كـەمی هـەبووە، ئەگەر بیانویـستبا لەگـەڵ خێزانەكانیانـــدا جـووتبن}، بۆیـە پـیاوانێـك خۆیـان ڕا نەگرتـوەو چوونەتە لای خێزانەكانیـان، بـەڵام دوایـی خـوا ﷻ ئـەم ئایەتـەی نـاردە خوارەوەو ئەو حوكمـەی لابـرد.

٤) هـۆی هاتنە خوارەوەی ئەو ڕستەیەی، كـە دەفـەرموێ: ﴿ وَكُلُواْ وَاشْرَبُواْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَكُمُ الْخَيْطُ الْأَبْيَضُ مِنَ الْخَيْطِ الْأَسْوَدِ ﴾، {(عَنْ سَهْلِ بنِ سَعدٍ ﷺ قَالَ: أُنْزِلَتْ: ﴿ وَكُلُواْ وَاشْرَبُواْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَكُمُ الْخَيْطُ الْأَبْيَضُ مِنَ الْخَيْطِ الْأَسْوَدِ ﴾، وَلَـمْ يَنْـــزِلْ: ﴿ مِنَ الْفَجْرِ ﴾ فَكَانَ رِجَالٌ إِذَا أَرَادوا الصَّوْمَ رَبَطَ أَحَدُهُم فِي رِجلَيهِ الخَيْطَ الأَبْيَضَ وَالخَيْطَ الأَسودَ، وَلَمْ يَزَلْ يَأْكُلُ حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَهُ رُؤْيَتُهُمَا، فَأَنْزَلَ اللهُ بَعْدَهُ ﴿ مِنَ الْفَجْرِ ﴾، فَعَلِمُوا أَنَّهُ إِنَّمَا يَعْنِي: اللَّيلُ وَالنَّهَار) (مُتَّفَقٌ عَلَيهِ، الْبُخَارِيُّ برقم: (١٩١٧)، وَمُسْلِمٌ بـرقم: (٢٥٣٠)}، واتـە: سـەهلی كوڕی سـەعـد

خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ: کاتێك خوا ئەم ئایەتەی ناردە خوار: ﴿ وَكُلُواْ وَاشْرَبُواْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَكُمُ الْخَيْطُ الْأَبْيَضُ مِنَ الْخَيْطِ الْأَسْوَدِ ﴾، وە وشەی: ﴿ مِنَ الْفَجْرِ ﴾، جارێ نە هاتبووە خوارێ، پیاوانێك ئەگەر ویستبایان بەڕۆژووبن (داو)ێکی ڕەش و (داو)ێکی سپییان بەپێی خۆیانەوە دەبەست، وە پارشێوەکە هەڵدەستان، هەتاکو ئەو دوو دەزووەیان بۆ لێك جیادەبوونەوە، سەرگەرمی خواردن دەبوون، دوایی خوای بەرز ئەم وشەیەی ناردە خوارێ: ﴿ مِنَ الْفَجْرِ ﴾، ئنجا زانییان کە ئەوە مەبەست پێ شەوو ڕۆژە (پێشێ وایانزانیوە مەبەست دوو داوە، دوو دەزووی ڕەش و سپی یە).

٥) هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ڕستەیەی، کە دەفەرموێ: ﴿ وَأْتُواْ الْبُيُوتَ مِنْ أَبْوَابِهَا وَاتَّقُواْ اللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴾ {(عَنِ البَرَاءِ ﷺ، قَالَ: نَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةَ فِينَا، كَانَتِ الأنصارُ إذَا حَجُّوا فجَاؤوا، لَمْ يَدْخُلُوا مِنْ قِبَلِ أبَوابِ بُيُوتِهِم، ولَكِن مِن ظُهُورِهَا، فَجَاءَ رَجُلٌ مِنْ الأنصَارِ فَدَخَلَ مِن قِبَلِ بَابِهِ، فَكَأَنَّهُ عُيِّرَ بذَلكَ، فَنَزَلَتْ: ﴿ وَأْتُواْ الْبُيُوتَ مِنْ أَبْوَابِهَا وَاتَّقُواْ اللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴾) (رَوَاهُ البُخَارِيُّ برقم: (١٨٠٣))}، واتە: بەڕاء خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ: ئەم ئایەتە دەربارەی ئێمە هاتە خوار (واتە: خەڵکی مەدینە) لە پێش ئیسلامدا ئەنصارییەکان عادەتیان وابوو، کە حەجیان کردوەو دوایی دەگەڕاونەوە لە دەرگای ماڵەکانیانەوە نا، بەڵکو لە پشتەوە ڕا چوونەتەوە (واتە: یان سەربانیان کون کردوە، یان دیوارییان دڕیوە) {چونکە گوتوویانە: کە ئیحرامان بەست، تازە بۆمان نیە هەتا حەج نەکەین، لە دەرگاوە بچینەوە ژوورێ، جاری واش هەبووە کابرا ئیحرامی بەستوە، بەڵام کارێکی هەبووەو پێویست بووە بچێتەوە ماڵەوە، دیارە لە سەردەمی نەفامییدا عادەتیان وابووەو لە سەردەمی ئیسلامیشدا بەوەوە هەر پابەندبوون} پیاوێك لە ئەنصارییەکان لە دەرگاوە چووەوە ماڵ، دوای ئەوەی حەجی کردبوو، جا بەهۆی ئەوەوە

ڕەخنـــەی لێگیـــراوە، خـــوای زانـــاش ئـــەم ئایەتـــەی نـــاردە خـــوارێ: ﴿ وَأْتُواْ ٱلْبُيُوتَ مِنْ أَبْوَٰبِهَاۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴾، (یـــانی: ئـــەوە عـادەتێکی نەفامییەو پێیـەوە پابەند مەبن).

٦) هۆی هاتنـە خـوارەوەی ئـەم ئایەتـەی، کـە دەفـەرموێ: ﴿ يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْأَهِلَّةِۖ قُلْ هِىَ مَوَٰقِيتُ لِلنَّاسِ وَٱلْحَجِّۗ وَلَيْسَ ٱلْبِرُّ بِأَن تَأْتُواْ ٱلْبُيُوتَ مِن ظُهُورِهَا وَلَٰكِنَّ ٱلْبِرَّ مَنِ ٱتَّقَىٰۗ وَأْتُواْ ٱلْبُيُوتَ مِنْ أَبْوَٰبِهَاۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴾، {(عَـن مُعَـاذ بْـنِ جَبَـلٍ ﷺ قَـالَ قُلْـتُ: يَارَسُـولَ اللهِ ﷺ إِنَّ الْيَهُـوَد تَغْـشَانا ويُكْـثِرُونَ مَـسَأَلتَنا عَـنِ الأهِلَّـةَ، فَأَنْـزَلَ اللهُ هَـذِهِ الآيَـةَ) (الجـامع فـي أسـباب النزول، ص (٧٠)، لحسن عبدالمنعم شـلبي)}، واتـە: (معـاذ)ی کوڕی جەبـەل خوا لێی ڕازی بـێ دەڵـێ: گوتم، ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ جوولەکـەکان زۆردێـن بۆ لامـانو زۆریـش پرسـیارمان لێدەکـەن دەربـارەی مانـگ کـە تـازە دەبێتـەوە (مانگی یەك شەوەو دوو شـەوە کە ئەوە، بۆچی وایەو حیکمەتی چییـە؟) خـوای پەروەردگـاریش ئـەم ئایەتـەی نـاردەخـوارێ ﴿ يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْأَهِلَّةِ ... ﴾.

## مانـای گشـتی ئایەتەکـان

وەك لە هۆی هـاتنە خوارەکەیدا باسـمکـرد، کەسێك کـە لـە ڕیوایەتێکـدا هاتوە دەڵێ: دەشتەکییەك بووە، وە لە ڕوایەتێکدا هاتوە کە پێغەمبـەر ﷺ لـە یەکێـك لـە جەنگەکـانـدا بـووە، لـە کـاتی ڕێگـابڕینـدا، هـاوەڵانی لێیـان پرسـیوە، گـرنگ ئەوەیـە پرسـیاری لێکـراوە دەربـارەی خـوا ﷻ ، ئـەویش فەرموویـەتی: ﴿ وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِى عَنِّى فَإِنِّى قَرِيبٌۖ ﴾، واتە: ئەگەر بەندەکانی من لەبارەی منـەوە پرسـیاریان لێکـردی: ئایـا لێیـان دوورم، یـان لێیـان نزیکـم؟ ئـەوە بـابزانن مـن نـزیکم ﴿ أُجِيبُ دَعْوَةَ ٱلدَّاعِ إِذَا دَعَانِۖ ﴾، هـەر بانگـکەرێك بـانگم بکـاتو هـەر

داواکارێك لێم بپاڕێتەوە، وەڵامی داواکەی دەدەمەوە، ئەگەر لێم بپاڕێتەوە ﴿ فَلْيَسْتَجِيبُواْ لِي وَلْيُؤْمِنُواْ بِي لَعَلَّهُمْ يَرْشُدُونَ ﴾، جا با ئەوان بەدەنگ منەوە بێن‌و ئیمان بە من بێنن، بۆ ئەوەی سەر ڕاست بن، واتە: کاتێك من بانگی وانم کردوە بەندایەتییم بۆ بکەن‌و ئیمانم پێ بێنن، با ئەوان بەڕاستی بەندایەتییم بۆ بکەن‌و ئیمانم پێ بێنن‌و، بەدەنگ بانگی شەریعەتەکەمەوە بێن، ئەوکاتە منیش بەدەنگیانەوە دێم‌و ئەگەر لێم بپاڕێنەوە، ئەوە مانای وایە ئەو کەسانە، کەسانێکی سەرڕاست‌و ڕێگای ڕاستگرتوو دەبن.

لێرەدا جێی سەرنج ئەوەیە کە خوا ﷻ پاش ئەوەی باسی ڕۆژووگرتنی مانگی ڕەمەزانی کردوە، ئنجا باسی نزیکی خۆی دەکات لە بەندەکانی‌و باسی پاڕانەوەیان دەکات، واتە: دوای ئەوەی ئینسان فەرمانی سەرشانی جێبەجێ دەکات بەرانبەر بە خواو بەندایەتیی بۆ خوا ئەنجام دەدات، ئنجا شایستەی ئەوەیە کە لە خوا نزیك بێتەوە، وە خوا لێی نزیك بێتەوەو لە خوا بپاڕێتەوەو، خوای پەروەردگاریش وەڵامی بداتەوە.

ئنجا دێتە سەر باسی چۆنیەتی مامەڵەکردنی ڕۆژووەوانان لە شەودا، دەفەرموێ: ﴿ أُحِلَّ لَكُمْ لَيْلَةَ ٱلصِّيَامِ ٱلرَّفَثُ إِلَىٰ نِسَآئِكُمْ ﴾، لە شەوانی ڕۆژووگرتندا بۆتان حەڵاڵ کراوە، کە لەگەڵ ژنەکانتاندا جووتبن ﴿ هُنَّ لِبَاسٌ لَّكُمْ وَأَنتُمْ لِبَاسٌ لَّهُنَّ ﴾، ئەوان پۆشاکن بۆ ئێوە، وە ئێوەش پۆشاکن بۆ ئەوان، وەك چۆن پۆشاك عەیبی ئینسان دادەپۆشێ، لە سەرماو گەرما دەیپارێزێ‌و جوانی دەکات، ژنیش بۆ مێرد وایە مێردیش بۆ ژن وایە، یەکترجوان دەکەن، یەکتر دەپارێزن لە گوناح‌و تاوان، وە یەکتر دەپارێزن لە هەموو ئەو شتانەی کە مایەی زەرەرو زیان‌و نیگەرانییانە ﴿ عَلِمَ ٱللَّهُ أَنَّكُمْ كُنتُمْ تَخْتَانُونَ أَنفُسَكُمْ ﴾، خوا زانی کە ئێوە ناپاکییتان لەخۆتان دەکرد، واتە: خۆتان ڕانەدەگرت، وەك عادەتی خۆتان کاتی خۆی وابووە، چونکە لە هیچ ئایەتێکی دیکەدا نەهاتوە کە خوا ﷻ بفەرموێ: لە شەوی ڕۆژووگرتندا مەچنەلای خێزانتان، کەواتە: دیارە ئەوە عادەتی پێش ئیسلامیان بووە، کە ئەگەر بەڕۆژووبووبان، بە شەوەکەی نەدەچوونە لای خێزانیان، بەڵام

دیاره خۆیان ڕانەگرتوه ﴿ فَتَابَ عَلَيْكُمْ وَعَفَا عَنكُمْ ﴾، بۆیە خوا تۆبەی لێوەرگرتن، وە لێی بوردن ﴿ فَٱلْـَٔـٰنَ بَـٰشِرُوهُنَّ ﴾، دەجا ئێستا (لەمەو دوا) بۆتان هەیە بچنە لایان‌و لەگەڵیان جووتبن ﴿ وَٱبْتَغُوا۟ مَا كَتَبَ ٱللَّهُ لَكُمْ ﴾، وە ئەوەی کە خوا بۆی نووسیون (بۆی نووسیون کە ژن‌و مێرد بەهۆی یەکترەوە لە حەرام پارێزراو بن، وە بەهۆی جووتبوونیانەوە منداڵی صاڵحیان پەیدابێ)، واتە: لە جووتبوونتان لەگەڵ هاوسەرانتاندا ئەو مەبەستە شەرعییانە ڕەچاوە بکەن ﴿ وَكُلُوا۟ وَٱشْرَبُوا۟ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَكُمُ ٱلْخَيْطُ ٱلْأَبْيَضُ مِنَ ٱلْخَيْطِ ٱلْأَسْوَدِ مِنَ ٱلْفَجْرِ ﴾، وە بخۆن‌و بخۆنەوە هەتاکو دەزووی سپی لە دەزووی ڕەشی بەرەبەیانتان بۆ لەیەك جیادەبنەوە، واتە: شەوو ڕۆژتان بۆ لەیەك جیادەبنەوە. ﴿ ثُمَّ أَتِمُّوا۟ ٱلصِّيَامَ إِلَى ٱلَّيْلِ ﴾، دوایی ڕۆژووگرتنەکەتان درێژە پێبدەن، تاکو شەو دادێ ﴿ وَلَا تُبَـٰشِرُوهُنَّ وَأَنتُمْ عَـٰكِفُونَ فِى ٱلْمَسَـٰجِدِ ﴾، وە مەچنە لایان لەکاتێکدا کە ئێوە لە ئیعتیکافدان لە مزگەوتەکاندا، یانی: بۆتان نیە لەکاتێکدا کە نیەتی ئیعتیکافتان هێناوە، بچنەوە ماڵێ‌و لەگەڵ خێزانتان جووتبن، بەڵام ئەگەر کارێکی پێویستت هەبوو بۆت هەیە بچیەوە ماڵێ، ئەگەرنا بەبێ پێویستی شوێنی ئیعتیکاف بەجێهێشتن، ئیعتیکافەکەت هەڵدەوەشێتەوە. ﴿ تِلْكَ حُدُودُ ٱللَّهِ فَلَا تَقْرَبُوهَا ﴾، ئەوانە سنوورەکانی خوان، جا توخنیان مەکەون، هەندێ جاران سنوورەکانی خوا هەر توخنکەوتنیشیان باش نیە، چونکە ڕەنگە بیانشکێنێ، هەندێ جاریش خوا دەفەرموێ: ﴿ تِلْكَ حُدُودُ ٱللَّهِ فَلَا تَعْتَدُوهَا ﴾، واتە: ئەوانە سنوورەکانی خوان، مەیانبەزێنن، دوایی حیکمەتی ئەمە ڕوون دەکەینەوە ﴿ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ ءَايَـٰتِهِۦ لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ ﴾، ئاوا خوا ئایاتەکانی خۆی بۆ خەڵکی ڕوون دەکاتەوە، بۆ ئەوەی پارێز بکەن، پارێزیان پەیدابێ.

ئنجا دێتە سەر باسی مەسەلەیەکی دیکەو دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تَأْكُلُوٓاْ أَمْوَٰلَكُم بَيْنَكُم بِٱلْبَٰطِلِ ﴾، وە ماڵی خۆتان لەنێوخۆتاندا بە ناهەق مەخۆن، دەفەرموێ: ماڵی خۆتان بە ناهەق مەخۆن، کە مەبەست پێی ماڵی یەکدییە، بەلام بۆیە وایفەرمووە، چونکە ماڵی هەرکەسێك لە مسوڵمانان دەبێ بەماڵی خۆتی بزانی، وە ماڵی تۆش ماڵی ئەوە ﴿ وَتُدْلُواْ بِهَآ إِلَى ٱلْحُكَّامِ ﴾، وە نەچن بەشێوەی بەرتیل (رشوة) ماڵەکەتان بگەیەنن بە دادوەرەکان، لەکاتێکدا کێشەو ناکۆکییەکتان دەبێ لەنێوانی خۆتاندا، یەکێکتان بچێ بەرتیل بدا بە دادوەر ﴿ لِتَأْكُلُواْ فَرِيقًا مِّنْ أَمْوَٰلِ ٱلنَّاسِ بِٱلْإِثْمِ وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴾، تاکو بە شێوەی گوناحبارانە (ستەمکارانە) بەشێك لە ماڵی خەڵکی بۆخۆتان بپچڕن کە دەشزانن حەرامە، (شتی وامەکەن).

ئنجا لە کۆتاییدا دەفەرموێ: ﴿ يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْأَهِلَّةِ ﴾، دەربارەی مانگە تازەبووەوەکان پرسیارت لێدەکەن، مانگ بۆچی وەك دەمی داسێکە، دەبێتە یەك شەوو دوایی دەبێتە دوو شەو دوایی گەورەتر دەبێت هەتا دەگاتە چواردەو پازدەو تەواو دەبێت، دوایی وردە وردە بچووك دەبێتەوە؟! ئاوا پرسیاریان لە پێغەمبەر ﷺ کردوە، دەفەرموێ: ﴿ قُلْ هِىَ مَوَٰقِيتُ لِلنَّاسِ وَٱلْحَجِّ ﴾ بۆیە مانگ بەو شێوەیە دانراوە: چەند مەنزڵێکی هەن، یەك شەوو دوو شەوو تا پازدەو، دوایی وردە وردە بەرەو بچووکبوونەوە دەچێ‌و دیار نامێنێ، بۆ ئەوەی ببێتە مایەی دیاریکردنی کاتەکانی کاروباری خەڵکی، تاکو سەری مانگ‌و نێوەڕاست‌و کۆتایی مانگی پێ بزانن، وە تاکو کاتی خواپەرستییەکانی حەجی پێ بزانن، ئنجا دەفەرموێ: ﴿ وَلَيْسَ ٱلْبِرُّ بِأَن تَأْتُواْ ٱلْبُيُوتَ مِن ظُهُورِهَا ﴾، وە چاکەکاریی ئەوەنییە کە لە پشتەوەدا بچنە ماڵەکانی خۆتانەوە، واتە: تەقواو لە خوا نزیکبوونەوە بەوە نیە دەست‌و پێی خۆتان ببەستن بە هەندێ عادەتی نەفامیی، کە خوا ﷻ لە شەریعەتی خۆیدا بڕیاری لەسەر نەداون ﴿ وَلَٰكِنَّ ٱلْبِرَّ

مَنِ ٱتَّقَىٰ ﴾، بەڵکو چاکەکاریی ئەوەیە کە ئینسان پارێزکاربێ بۆ خوا ﴿ وَأْتُواْ ٱلْبُيُوتَ مِنْ أَبْوَٰبِهَا ﴾، وە لە دەرگاکانی خۆیانەوە بچنە ماڵەکانتانەوەو پێویست ناکات سەربان بکوڵن، یان دیوار بدڕن ﴿ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴾، وە پارێزکاریی لە خوا بکەن بۆ ئەوەی سەرفرازبن‌و بەختەوەر بن‌و، بە مرادو ئامانجەکانی دنیاو دوارۆژتان بگەن، واتە: لە ڕێی تەقواوە لە خوا نزیك دەبنەوەو بە ئامانج دەگەن، نەك لە ڕێی هەندێك عادەت‌و نەریت کە لە شەریعەتی خوادا بڕیاریان لەسەر نەدراوە.

## چەند مەسەلەیەکی گرنگ

**مەسەلەی یەکەم:** خوا ﷻ پاش ئەوەی باسی ڕۆژووگرتنی مانگی ڕەمەزانی کرد، ئنجا باسی نزیکی خۆی دەکات لە بەندەکانی، ئەمەش ئەوەی لێوەردەگیرێ کە ئینسان دوای ئەوەی کە طاعەت بۆ خوا ئەنجام دەدات، ئەوجار دەبێتە بەندەی خواو لە خوا نزیك دەبێتەوە، چونکە گرنگ ئەوەیە تۆ لە خوا نزیك بی، ئەگەرنا خوا ﷻ لە ئێمە هەر نزیکە، بەڵام گرنگ ئەوەیە کە ئێمە خۆمان لە خوا دوور نەگرین، ئنجا ئەمە ئەوەی لێوەردەگیرێ، کە ئینسان بەهۆی طاعەتەوە بەتایبەتی ڕۆژوو، کە ڕووحانییەتێکی زۆری تێدایە، صاف‌و ساغ دەبێتەوەو لە خوا نزیك دەبێتەوە، وە کاتێکیش ئینسان لە خوا نزیك دەبێتەوە، ئەگەر لێی بپاڕێتەوەو داوای لێبکات، بێگومان خوا ﷻ کەسێك لێی نزیك بێ‌و بۆی فەرمانبەربێ، وە کەسێك بۆی گونجاوو صوڵحاو بێت، تەکلیفی دەگرێتەوەو داواکەی وەردەگرێت.

**مەسەلەی دووەم:** ئەم ئایەتە قورئانیە زۆر جێی سەرنجە، کە دەفەرموێ: ﴿ وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِى عَنِّى فَإِنِّى قَرِيبٌ ۖ أُجِيبُ دَعْوَةَ ٱلدَّاعِ إِذَا دَعَانِ فَلْيَسْتَجِيبُواْ لِى وَلْيُؤْمِنُواْ بِى لَعَلَّهُمْ يَرْشُدُونَ ﴾، لەم ئایەتە قورئانیەدا حەوت ئاماژە

کراون بە خوا ﷻ و، حەوت ئاماژەش بە بەندەکانی، واتە: لە حەوت شوێناندا باسی خوای پەروەردگار کراوەو ئاماژەی بۆ کراوە، لە حەوت شوێنانیشدا باسی بەندە کراوە، بە ئەندازەی یەك:

**یەكەم:** ئەو شوێنانەی باسی بەندەکانیان تێداکراوە، یان ئاماژەیان بۆ کراوە:

١) ﴿ وَإِذَا سَأَلَكَ ﴾، وە ئەگەر لێیان پرسی، لێرەدا ڕاناوی ﴿ ك ﴾، بۆ پێغەمبەری خوایە ﷺ.

٢) ﴿ عِبَادِي ﴾، بەندەکانم.

٣) ﴿ ٱلدَّاعِ ﴾، داواکەر.

٤) ﴿ إِذَا دَعَانِ ﴾، ئەگەر لێم پاڕایەوە.

٥) ﴿ فَلۡيَسۡتَجِيبُواْ لِي ﴾، پیتی: ﴿ وا ﴾ ڕاناوی کۆی نادیار (ضمير جمع غائب)ە، واتە: با ئەوان بە دەنگمەوە بێن.

٦) ﴿ وَلۡيُؤۡمِنُواْ بِي ﴾، با ئیمانم پێ بێنن.

٧) ﴿ لَعَلَّهُمۡ يَرۡشُدُونَ ﴾، بۆ ئەوە کە سەر ڕاست بن، ئەوە هەر حەوت شوێنەکە بەنسبەت بەندەکانەوە.

**دووەم:** ئەو شوێنانەی باسی خوای بەبەزەیی یان تێداکراوە، یان ئاماژەی پێکراوە:

١) ﴿ وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِي ﴾، وە ئەگە بەندەکانم لێیان پرسی، ڕاناوەکە بۆ خوا دەگەڕێتەوە.

٢) ﴿ عَنِّي ﴾ دەربارەی من.

٣) ﴿ فَإِنِّي ﴾، بێگومان بن.

٤) ﴿ أُجِيبُ ﴾، وەڵام دەدەمەوە، لێرەدا (أُجيبُ) ڕاناوی قسە بێژ (مُتَكَلِّم)ی تێدا شێرراوەتەوە.

٥) ﴿ دَعَانِ ﴾، بانگم بکات، لێم وەپاڕێ.

٦) ﴿ فَلْيَسْتَجِيبُواْ لِى ﴾، با وەڵامم بدەنەوە، با بەدەنگمەوە بێنو فەرمانبەرم بن.

٧) ﴿ وَلْيُؤْمِنُواْ بِى ﴾، وە بڕوام پێبێنن.

ئەمەش ئەوەی لێوەردەگیرێ کە خوا ﷻ بەندەی خۆی زۆر خۆشدەوێو زۆر گرنگی پێ دەداو زۆر ڕێزی دەگرێ، چونکە هەر سیفەتێکی خۆی لەگەڵ سیفەتێکی بەندەکەیدا بەراورد کردوە.

**مەسەلەی سێیەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ فَإِنِّى قَرِيبٌ ﴾، بێگومان من نزیکم، جێی سەرنج ئەوەیە کە دەفەرموێ: ﴿ وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِى عَنِّى فَإِنِّى قَرِيبٌ ﴾، نەیفەرمووە: (فَقُلْ لَهُمْ إِنِّي قَرِيب) یەکسەر فەرموویەتی: من نزیکم، واتە: پێغەمبەری ﷺ نەکردۆتە واسیتەی نێوان خۆیو بەندەکانی، ئەمەش یانی: هەر بەندەیەك ویستی لەگەڵ خوا بدوێ، با یەکسەر ڕاستەوخۆ پەیوەندی پێوە دەکاتو، پێویست ناکا لەڕێی پێغەمبەرەوە ﷺ بێ، کەواتە: لە ئیسلامدا کەهەنووت نیە، لە ئیسلامدا ئینسانەکان هەموویان ڕاستەوخۆ دەتوانن لەگەڵ خوای خۆیاندا ڕازو نیاز بکەنو، لێی بپاڕێنەوەو بەندایەتیی بۆ بکەن، بە پێچەوانەی ئایینی شێوێنراوی نەصرانییەتەوە، کە لە ڕێی کاهینەوە نەبێتو لەڕێی تەبەقەی پیاوانی دینی یەوە نەبێ، مرۆڤ بۆی نیە ڕاستەوخۆ بەندایەتی بۆ خوا بکات، بەڵام لە ئیسلامدا وانیەو تەنانەت پێغەمبەری خواش ﷺ خوا نەیکردوە بە هۆکار (واسطة)ی نێوانی خۆیو بەندەکانی، مەگەر هۆکاری ئەوە کە پەیامی خوایان پێ بگەیەنێو بەرنامەی خوایان لێ حاڵی بکات، وەك خوا فەرموویەتی ﴿ مَّا عَلَى ٱلرَّسُولِ إِلَّا ٱلْبَلَـٰغُ ۗ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ مَا تُبْدُونَ وَمَا تَكْتُمُونَ ﴿٩٩﴾ ﴾ المائدة، واتە: پێغەمبەر ﷺ بەس گەیاندنی لەسەره وە خوا ئەوەی دەریدەخەنو پەنهانی دەکەن دەیزانێ، بەڵام دوای ئەوە بەندەکانی بۆخۆیان بەرپرسیارن، بەپێی بەرنامەو شەریعەتی خوا مامەڵەی ڕاستەوخۆ لەگەڵ خوادا

دەکەن، نەك ناڕاستەوخۆ، ئەمەش ئەو ڕاستییە دەردەخات، کە بەڕاستی هەندێك لە ئەهلی تەصەووف لێرەدا تووشی لادان (إنحراف) بوون و، شتێك دەکەن وەك هی نەصرانییەکان دەچێت، ئەویش ئەوەیە کە دەبێ شێخ ببێتە (واسطة)، ئنجا بۆ سەلماندنی ڕایەکەیان بەڵگەیەکی سەیرۆکەش دێننەوەو دەڵێن: (واتە: ئەو صۆفیانەی هاوچەرخ) دەڵێن: وەك چۆن کارەبا دەبێ محاویلەی بۆ دابنرێ و ئەگەر بێت و، یەکسەر بیگەیەنی هەموو شتێك دەسووتێنێ ! خوای پەروەردگاریش ئینسان ناتوانێ ڕاستەوخۆ پەیوەندیی پێوە بکات، بەڵکو دەبێ لەڕێی پێغەمبەرەوە ﷺ بێ و پێش ویش لە ڕێی شێخەوە !! بەڵام لە ڕاستیدا ئەوە قیاسی خوای پەروەردگارە لەسەر دروستکراوەکانی، نەخێر خوا ﷻ ئەگەر ڕاستەوخۆش پەیوەندی پێوە بکرێ، کەس ناسووتێنێ، چونکە خوای کاربەجێ بۆخۆی چۆنیەتی داباریی بەخشش (فیض) و بەرەکەتی خۆی بۆ سەر بەندەکانی ڕێکخستوەو هەرکەس بە ئەندازەی خۆی فەیزو نووری بەسەردا دەبارێنی و، وەك سەرچاوەی کارەبا نیە، کە قوەتی زۆربداتێ و بیسووتێنێ ! خوا ﷻ زاناو کاربەجێیە، وەك پیرەمێردی شاعیر دەڵێ:

کاکە خوا کاری نابەجێ ناکا

تا کێو نەبینێ بەفری تێناکات

**مەسەلەی چوارەم:** خوا ﷻ زۆر بە مسۆگەریی دەفەرموێ: من وەڵامی داوای داواکەر دەدەمەوە، ئەگەر لێم پاڕایەوە، لێرەدا یەکێك بۆی هەیە بڵێ: ئەدی بۆچی زۆر کەس لە خوا دەپاڕێتەوەو ئەو شتەش کە بۆی دەپاڕێتەوە جێبەجێ نابێ؟ بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە فەرموودەیەکی پێغەمبەر ﷺ هەیە ئەوەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە، کە وەڵامدانەوەی خوا بۆ پاڕانەوەی بەندەکانی، هەر یەك شێوە نیە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {(مَا مِنْ مُسْلِمٍ يَدْعُو بِدَعْوَةٍ لَيْسَ فِيهَا إِثْمٌ وَلاَ قَطِيعَةُ رَحِمٍ، إِلاَّ أَعْطَاهُ اللَّهُ بِهَا إِحْدَى ثَلَاثٍ: إِمَّا أَنْ تُعَجَّلَ لَهُ دَعْوَتُهُ، وَإِمَّا أَنْ يَدَّخِرَهَا لَهُ فِي الآخِرَةِ، وَإِمَّا أَنْ يَصْرِفَ عَنْهُ

مِـنْ الـسـوءِ مِثْلَـهَا) (رَوَاهُ البُخَـارِيُّ فـي الأَدَب الـمفرد) بـرقم: (٧١٠)، وَالحَـاكِمُ بـرقم: (١٨١٦)، وَوَافَقَـهُ الذَّهَبـي، عَـنْ أَبِـي سَـعِيدٍ الخُـدريّ رضي الله عنه، وَصَحَّـحَهُ الألبانـي فـي (المشـكاة) بـرقم: (٢٢٥٩)}، واتـه: هـیچ مـسولْمانێك نیـه لـه خـوا بپاڕێتـەوە بـه پاڕانەوەیـەك، پاڕانەوەکـە لـە خـودی خۆیـدا گونـاح نەبێت (شتێکی بێجێو گونـاح نەبێ)، وە مایەی پچڕانی پەیوەندی خزمایەتی نەبـێ (چونکە خوا لەگەڵ شتی گوناحو شتی ناشەرعیی دانیـە)، ئـەوە خـوا تعالى یەکێـك لە سێ شتان بۆ ئـەو بەندەیـەی خۆی دەکات: یـان ئـەوەتا ئـەو شـتەی داوای دەکـات یەکـسەر بـۆی جێبـەجێ دەکـات، یـاخود بـۆی هەڵـدەگرێو پاداشتەکەی لـە دواڕۆژدا دەداتـەوە، یان بـە قـەدەر ئـەو شـتە باشـەی کـە داوای کردوە، خراپەیەکـی لـێ لادەدات (داوای شتێکی باشی کردوە، خوا شتە باشەکەی بۆ ناکـات، حیکمەتی خوا وا ناخـوازێ، بەڵام بە قـەدەر ئـەو شـتە باشـە یـاخود زیـاتر خوا خراپـەو بەڵای لـێ لادەدات).

ئـەم فەرموودەیـە ئـەوە دەگـەیەنـێ، کـە ئینـسان کاتێـك کـە لـە خـوا دەپاڕێتـەوەو خـوا یەکـسەر وەڵامـی ناداتـەوە، واتـە: وەڵامەکـە نابینـێ بـا نائومێـد نەبـێ، وەك: پێغەمبـەر صلى الله عليه وسلم فەرموویـەتی: {(يُستجَابُ لأَحَدِكُمْ مَا لَمْ يَعْجَلْ، يَقُولُ: دَعَوْتُ فَلَمْ يُستجَبْ لِي) (رَوَاهُ البُخَارِيُّ بـرقم: (٦٣٤٠) وَاللَّفْظُ لَهُ، وَمُسْلِمٌ بـرقم: (٦٨٦٩)، وَأَبُو دَاوُدَ بـرقم: (١٤٨٤)، وَالتِّرمِذِيُّ بـرقم: (٣٣٨٧)، وَابْنُ مَاجَـهْ بـرقم: (٣٨٥٣)، وَمَالِـك بـرقم: (٥٠٦)، وَابْـنُ حِبَّانَ بـرقم: (٩٧٥)، عَـنْ أَبِي هُرَيْـرَةَ رضي الله عنه}، واتـە: یەکێـك لـە ئێـوە وەڵامـی دەدرێتـەوە، ئەگـەر پەلـە نەکـات {کـاتێك لـە خـوا دەپاڕێتـەوە، حەتمـەن پاڕانەوەکـەی بـێ وەڵام نابـێ، جا ئایا پەلـە کردنەکـەی چییە؟} دەڵـێ: لـە خـوا پاڕامـەوە بـەڵام وەڵامـی نـەبووو شـتەکەی بـۆ نەکـردم! بـا پەلـە نەکـات چـونکە خـوا تعالى لەوکاتـەدا کە خۆی بە بەرژەوەندیـی دەزانی بۆ بەنـدەی خۆی، وە ئـەو شتەی کـە بۆخـۆی بـە چـاکی دەزانـێ، ئـاوا وەڵامـی دەداتـەوە، نـەك ئـەوەی کـە ئـەو دەیـەوێ، چونکە ئینـسان جـاری وایـە شـتێك لـە خـوا داوا دەکـات، ئەگـەر بـۆی

بكات زەرەری لێ دەكات، بۆ وێنە: جاری وایە باب، یان دایك لە منداڵێكی خۆی تووڕە دەبێ، یان كەسێك لە خزمێكی نیگەران دەبێو دووعای خراپی لێ دەكات، جا ئەگەر خوا یەكسەر بۆی بكات، ڕەنگە پەشیمان بێتەوە، بۆیە بۆی ناكات، كەواتە: دەبێ ئینسان نائومێد نەبێ، كاتێ كە ڕاستەوخۆ وەڵامی پاڕانەوەكەی نابینێ، بەڵكو دڵنیابێ لەوەی كە خوا پاڕانەوەكەی دەبیستێو زایە نەبووە، وە بەیەكێك لەو سێ حاڵەتە داوایەكەی بۆ جێبەجێ دەكات، بەڵام ئێستا نا دوایی، لەوكاتەدا كە خوا دەیەوێ، یاخود خراپەی لێ لادەدات، یان لە قیامەتێ پاداشتی دەداتەوە، ئەمەش چەند فەرموودەیەك كە گرنگیی‌و گەورەیی دووعایان تێدا دەبینرێ:

**فەرموودەی یەكەم:** پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {(إِنَّ الدُّعَاءَ هُوَ العِبَادَةُ) (رَوَاهُ ابْنُ مَاجَهْ برقم: (٣٨٢٨)، عَنْ النُّعمَانِ بنِ بَشِيرٍ رضي الله عنه، وَحَسَّنَهُ الألباني في (سنن أبي داود)}، واتە: پاڕانەوە خودی خواپەرستییە، واتە: بەشێكی گەورەو گرنگی خواپەرستیی، بریتییە لە پاڕانەوە لە خوا.

**فەرموودەی دووەم:** پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {(مَنْ لَمْ يَدْعُ اللهَ، سُبْحَانَهُ غَضِبَ عَلَيْهِ) (رَوَاهُ ابن ماجه برقم: (٣٨٢٧)، عَنْ أبي هُرَيرَةَ رضي الله عنه، وَصَحَّحَهُ الألباني في (السلسلة الصحيحة) برقم: (٣٦٥٤)}، واتە: هەر كەسێك لە خوا نەپاڕێتەوە خوا لێی تووڕە دەبێ، جا ئایا بۆچی هەركەسێك داوا لە خوا نەكاتو لێی نەپاڕێتەوە، خوا لێی تووڕە دەبێ ؟! چونكە دیارە خۆی بێنیاز دەبینێ لە خوا !!

**فەرموودەی سێیەم:** پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {(لاَ تَعْجِزُوا في الدُّعَاءِ، فَإِنَّهُ لاَيَهلكُ مَعَ الدُّعَاءِ أَحَدٌ) (رَوَاهُ الحاكم برقم: (١٨١٨)، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رضي الله عنه، وَضَعَّفَهُ الألباني في (السلسلة الضعيفة) برقم: (٨٤٣)}، واتە: ئێوە دەستەوستان مەبنو تەنبەڵ مەبن لە پاڕانەوە، چونكە لەگەڵ دووعاكردندا هیچ كەس نافەوتێ، واتە: مادام ئینسان بەردەوام بێ لەسەر

دووعـاو پاڕانــەوە لــە خـــوا، بــە تەئكـــید نافــەوتیّو خــوای پــەروەردگار بــە دەنگیەوە دێو بەدەمیــەوە دەچێ.

**فەرموودەی چوارەم:** پێغەمبەر ﷺ فەرموویــەتی: {(لاَيُـرَدُّ القَـدَرَ إلاَّ الدُّعَـاءُ، وَلاَ يَزِيدُ في العُمرِ إلاّ البِرُّ، وَإنَّ الرَّجُلَ لَيُحَرمِ الرزق بالذَّنبِ يُصِيبُهُ) (رَوَاهُ الحاكـم بـرقم: (١٨١٤)، عَنْ ثَوبَـان رضي الله عنه، وَحَسَّنَهُ الأَلْـباني فـي (السلسلة الـصحيحة) بـرقم: (١٥٤)، دون وَإنَّ الرَّجُـلَ لَيُحَـرم...}، واتــە: هــیچ شــتێك قــەدەری خـوا ڕەت ناكــاتەوە جگــە لــە دووعــا، {دووعــا قــەدەر ڕەت دەكاتــەوە چونكــە دووعــاش بەشێكە لــە قــەدەری خــوا: خــوا شــتێكی بڕیــارداوە كــە ئــەو شتە ببێ، لە هەمان كاتـدا بڕیاریـشـی داوە، كـە ئـەگـەر ئـەو بەنـدەیـە دووعـای كرد ئەو شتە نابــێ} وە هیچ شتێك تەمەن زیاد ناكـا جگــە لـە چاكەكــاریی، وە جاری وا هەیە ئینسـان لە ڕزقێــك بێبــەش دەبێ بەهــۆی گوناحێكـــەوە كــە كردوویـــەتی، دیـــارە بـــە هەمـــان شـێوە: جـاری واش هەیـــە بـــەهۆی چاكەیەكـــەوە بـەهۆی دووعایەكـــەوە، كـە دەیكات خـوا بەلایـەكی لــێ لادەدا، یاخــود شــتێكی باشــی بەنــسیب دەكــات.

**مەسـەلەی چوارەم:** كـە خــوای بەرزومــەزن دەفــەرموێ: ﴿ فَإِنِّي قَرِيبٌ أُجِيبُ دَعْوَةَ ٱلدَّاعِ إِذَا دَعَانِ ﴾، لـە چ كاتێكدا وا دەفـەرموێ؟ دەفـەرموێ: ﴿ فَلْيَسْتَجِيبُواْ لِي وَلْيُؤْمِنُواْ بِي ﴾، واتە: من وەڵامیان دەدەمەوە بە دوو مەرجــان:

١/ بـا ئــەوان وەڵامــم بدەنـــەوە.

٢/ وە بـا بەڕاســتیی ئیمـــانم پــێ بێنـــن، وەڵامـــم بدەنـــەوە بــە جێبـەجێكــردنی بەرنامـەو شــەریعەتەكەم، ئیمانیــشــم پــێ بێـنن كـە جێبــەجێكردنی بەرنامــەو شــەریعەتەكەم بــە ئیمــانو عەقیدەیــەكی ڕاســتو ســاغەوە بێــت ﴿ لَعَلَّهُمْ يَرْشُدُونَ ﴾، بەڵكو سـەر ڕاسـت دەبنو ڕێی ڕاسـت دەگرن.

**مەسەلەی پێنجەم:** کە دەفەرمووێ: ﴿ أُحِلَّ لَكُمْ لَيْلَةَ ٱلصِّيَامِ ٱلرَّفَثُ إِلَىٰ نِسَآئِكُمْ ﴾، هەندێ لە توێژەرەوانی قورئان گوتوویانە: ئەم ڕستە قورئانییە کە دەفەرموێ: بۆتان حەلاڵکراوە لە شەوانی ڕۆژووگرتندا لەگەڵ هاوسەرانتاندا جووتبن، ئەوە دەگەیەنێ کە پێشتر حوکمێکی دیکە بوو بێتو ئەمەی (نَسْخ) کردبێتەوە، واتە: پێشتر قەدەغە بووبێو ئەم ڕستەیە حەلاڵی کردبێ، بەڵام ئێمە دەڵێین: لەڕاستیدا لە قورئاندا شتی وا نەهاتوە، هیچ کام لە توێژەرەوانی قورئان باسیان نەکردوە، کە خوا ﷻ ئایەتێکی دیکەی ناردبێو فەرمووبێتی: لە شەوانی ڕۆژووگرتنی ڕەمەزاندا مەچنە لای خێزانتان، کەواتە: ئەوەی کە (مَنْسوخ)ە، بە تەئکید لە قورئاندا نیە.

ئنجا لە هیچ فەرموودەیەکی پێغەمبەریشدا ﷺ نەهاتوە، کە لە ڕێیەکی ڕاستەوە بە ئێمە گەیبێو، دیسان لە سوننەتیشدا شتێکی وامان لەبەر دەستدانیە، کە پێغەمبەر ﷺ لە شەوانی ڕۆژووگرتندا قەدەغەی کردبێ بچنە لای خێزانی خۆیان، کەواتە: ئایا ئەو مەسەلەیە چۆنە؟! وەك لە مانا گشتییەکەشدا باسمکرد، عەرەبەکان عادەتیان وابووە لە پێش ئیسلامدا ئەگەر ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان، یان ڕۆژووی دیکەیان بگرتایە نەدەچوونە لای خێزانیان لە شەوەکەیدا، بۆیە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ أُحِلَّ لَكُمْ ﴾، واتە: ئەوەی کە لە خۆتان حەرام کردبوو، خوا بۆی حەڵاڵ کردن، ئنجا لە قورئانیشدا وشەی: ﴿ أُحِلَّ ﴾، جاری وایە بەکارهاتوە بۆ شتێك کە خوا حەڵاڵو موباحی دەکات، وەك ئەسڵو حاڵەتی ئاسایی، واتە: حەڵاڵیی و موباحییەکەی دەخاتەڕوو، نەك کە ئەو شتە پێشتر قەدەغە بووبێ، بۆ وێنە: کە بێگومان پێشتریش ﴿ يَسْـَٔلُونَكَ مَاذَآ أُحِلَّ لَهُمْ ۖ قُلْ أُحِلَّ لَكُمُ ٱلطَّيِّبَٰتُ ...﴿٤﴾ ﴾ المائدة، هەر حەڵاڵ بوونو قەدەغە نەبوون.

**مەسەلەی شەشەم:** ئنجا خوای زانا، کە وشەی: ﴿ ٱلرَّفَثُ ﴾، بەکاردێنێ وشەی: ﴿ ٱلرَّفَثُ ﴾، کە (الزَجّاج) کە یەکێکە لە زانایانی زمانزان، دەڵێ: (الرَّفَثُ: كَلِمَةٌ جَامِعَةٌ لِكُلِّ مَايُرِيدُ الرَّجُلُ مِنِ امرَأتِهِ) واتە: (رَفَثْ) وشەیەکی کۆکەرەوەیە (تەعبیرێکە) هەموو ئەو شتانە دەگرێتەوە کە پیاو لە خێزانی خۆی دەوێن، پیاو لە خێزانی خۆی چی دەوێ ؟ ماچکردنو، دەستبازییو جووتبوون، کە (الرَّفَثُ) هەموویان دەگرێتەوە، جا ئەگەر سەرنجی قورئان بدەین، دەبینین لەجیاتی جووتبوون (جماع) وشەی: (الرَّفَث)ی بەکارهێناوە، وشەی: ﴿ ... لَٰمَسْتُمُ ٱلنِّسَآءَ ...﴿٦﴾ ﴾ المائدة،ی بەکارهێناوە، واتە: دەستتان گەیاندە خێزانەکانتان، وە وشەی (أَفْضى)ی بەکارهێناوە: ﴿ ... وَقَدْ أَفْضَىٰ بَعْضُكُمْ إِلَىٰ بَعْضٍ ...﴿٢١﴾ ﴾ النساء، واتە: هەندێکتان چوونە لای هەندێکتان، وە وشەی: ﴿ تُبَٰشِرُوهُنَّ ﴾ی بەکارهێناوە، واتە: پێستتان بە پێستیان بکەوێ، کە هەموویان تەعبیرو وشەی زۆر بە ئەدەبو بە نەزاکەتن، بۆ ئەوەی ئەو کارە جینسییەی نێوان ژنو پیاو ڕوو بەڕاشکاویی باسی نەکرێ، بۆیە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس کە گوتوویەتی: ((إنَّ الله كَرِيْمٌ يُكَنِّي)) واتە: خوا ﷻ کەریمو بەڕێزە، بۆیە بە کینایەو بە ڕەمزو هێما باسی هەندێك شت دەکات، کە ناشیرینە بە زەقیی باس بکرێ، بە گوێرەی عورفو باوی خەڵك، کەواتە: ئێمەش دەبێ هەروابینو، تەعبیری بەڕێزو وشەی بە نەزاکەت بەکاربێنن، بۆ ئەو شتانەی کە ناشیرینە بە زەقیی باس بکرێن.

**مەسەلەی حەوتەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ هُنَّ لِبَاسٌ لَّكُمْ وَأَنتُمْ لِبَاسٌ لَّهُنَّ ﴾، لێرەدا بەڕاستی خوا ﷻ پەیوەندی نێوان ژنو مێردی بەم ڕستە قورئانییە، زۆر بە تەعبیرێکی ناسكو نەرمو وردو جێی سەرنج ڕوون کردۆتەوە، دەفەرموێ: ئافرەتان پۆشاکن بۆ ئێوە، ئێوەش پۆشاکن بۆ ئەوان، پۆشاك چ دەورێك دەبینێ بۆ ئینسان ؟

**یەکەم:** لە سەرماو گەرما دەیپارێزی.

**دووەم**: عەورەتی دادەپۆشێ‌و لە عەیب‌و عار دەرکەوتن دەیپارێزێ.

**سێیەم**: جوانی دەکات، وە قەدو قیافەیەکی جوانی پێدەدا، کەواتە: ژنیش بۆ پیاو وایە، وە پیاویش بۆ ژن هەر وایەو هەر کامێك لە ژن‌و مێرد یەکتر دەپارێزن لە گوناح‌و خراپەو عەیب‌و عار، وە یەکتریش جوان دەکەن، وە ئەم ڕستەیە ئەوەش دەگەیەنێ کە لە ئیسلامدا ژن‌و مێرد، یاخود پیاو ئافرەت، وەك یەك تەماشا کراون، وەك لە جێیەکی دیکە هەر لەم سوورەتەدا دەفەرموێ: ئەو هەقەی بۆ پیاو هەیە لەسەر ژن، بۆ ژنیش هەیە لەسەر پیاو: ﴿ ... وَلَهُنَّ مِثْلُ ٱلَّذِى عَلَيْهِنَّ بِٱلْمَعْرُوفِ ... ﴿٢٢٨﴾ ﴾البقرة، واتە: چۆن پێویستە لەسەر ئافرەت بە ڕێك‌و پێكیی مامەڵە بکات لەگەڵ پیاودا، بەهەمان شێوە لەسەر پیاویش پێویستە بەو شێوەیەی کە ڕێك‌و پێکەو پێی خۆشە کە ژنەکەی مامەڵەی لەگەڵدا بکات، پێویستە ئەویش بەو شێوەیە مامەڵەی لەگەڵدا بکات، بۆیە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس خوا لە خۆی‌و بابی ڕازی بێ، گوتوویەتی: {إنِّي أتَجمَّلُ لاَمرأتي كَمَا تَتَجَمَّلُ لِي لأن الله تعالى يقول: ( ولهن مثل الذي عليهن بالمعروف) ، رواه ابن جرير وابن أبي حاتم}[1]، واتە: من خۆم بۆ خێزانی خۆم جوان دەکەم‌و دەڕازێنمەوە، وەك چۆن ئەو خۆی بۆ من جوان دەکات، چونکە خوا فەرموویەتی: (( وە ژنان مافیان لەسەر مێردیان هەیە کە ئەوان لەسەریان هەیانە))، کە دیارە لێرەی وەرگرتوە، کە وەك چۆن پیاو ئەو هەقەی لەسەر ژنی خۆی هەیە، کە خۆی بۆ جوان بکات‌و، خۆی بۆ بۆنخۆش بکات‌و بڕازێنێتەوە، ژنیش ئەو هەقەی لەسەر مێردی خۆی هەیە.

**مەسەلەی هەشتەم**: ئەوە کە دەفەرموێ: ﴿ عَلِمَ ٱللَّهُ أَنَّكُمْ كُنتُمْ تَخْتَانُونَ أَنفُسَكُمْ ﴾، (راغب) دەڵێ: (تَخْتَانُونَ)، جیایە لە (تَخونون)، نەیفەرمووە: (تخونون أَنْفسَكُمْ) خیانەتتان بە خۆتان دەکرد، دەڵێ: (الإِخْتِيَانُ: مُرَاوَدَةُ

---

١) (المصباح المنير في تهذيب تفسير إبن كثير)، ص: (١٦٦) .

الخِيَـانَة وَهِـيَ تَحَـرك شـهوَةِ الإنـسانِ لِتَحَـرِّي الخِيَانَـة)، واتـه: (الإِخْتِيَـانُ) بريتيـه لـه هـەولّـدان بـۆ خيانەتكـردن‌و جـوولانی ئـارەزووی ئینـسـان بـەرەو ناپاكیی، واته: دەتـانويست ئەوه بكـەن، بەلام نەگەیشـتنه ئـەوەی كـه بیكـەن، دیاره لە هەندێ ڕیوایەتانیشدا هاتوه كه هەندێ لە هـاوەڵانیش چوونەتـه لای خێزانیـان لـه شـەوی ڕۆژووگرتنـدا، وه دواییش چوونەته لای پێغەمبەر ﷺ و خـوای پەروەردگـار ئەم ئایەتـەی ناردۆتـه خـوارێ.

**مەسـەلەی نۆیـەم:** كـه دەفـەرموێ: ﴿ وَٱبۡتَغُواْ مَا كَتَبَ ٱللَّهُ لَكُمۡ ﴾، واتـه: كـه جووتبـوون لەگـەڵ خێزانتانـدا، ئـەوە داوا بكـەن كـه خـوا بـۆی نووسـیون، توێژەرەوانی قورئـان بە چەند جۆرێك لێكیان داوەتـەوە، زۆربـەیان گوتوویانـه: واته: بەنیەتی ئەوە بچنـه لای خێزانتـان كه خـوا منداڵـتان بداتـێ كـوڕ یـان كـچ، گرنگ ئەوەیه كه صـالح بێ‌و سـەلامەت بێ، بەلام بێگومـان وێـڕای ئەمـه، ئەوەش دەگەیەنێ: كه بەو نیەتەوە پیـاو لەگەڵ خێزانی جووتبـێ كـه پـارێزراو بـێ لـه حـەرام، خۆشـیی‌و خێزانیشی، هەروەها ئـەوەش دەگەیـەنێ كـه كاتێك لەگـەڵ خێزانتـانـدا جـووت دەبـن، بـەو شـێوەیەو لـەو شـوێنەدا لەگەڵیـان جووتـبن، كـه خـوا بـۆی ڕەواو حـەڵاڵ كـردوون، واتـه: كاتێـك لـه حـەیز دان، مەچنەلایـان، وه لـه غـەیری شـوێنی منـداڵ لـێ پەیدابوونـەوە مەچـنەلایان، واته: نابێ ئینسـان له پشـتەوە ڕا بچێتـه لای خێزانی، چونكه ئەو شـوێنه نیـه كه خـوا نووسـیویەتی‌و بڕیاری لەسـەر داوە كـه پیـاو ژن بەیەكـەوە جووتبن، ئـەم ڕسـته قورئانییه ئەوانه هەموو دەگەیەنێ.

**مەسـەلەی دەیـەم:** كـه باسی ئیعتیكاف دەكات‌و دەفـەرموێ: ﴿ وَلَا تُبَٰشِرُوهُنَّ وَأَنتُمۡ عَٰكِفُونَ فِي ٱلۡمَسَٰجِدِ ﴾، وەك گـوتم: ئەسـڵی (مُبَاشَـرَة) لـه زمـانی عەرەبیـدا: (هِـيَ التِصَـاقُ البَشَـرَة بالبَشْرَة)، واتـه: پێـست وه پێـست بكەوێ، ئەگەر پێستی دوو نەفـەر بەیەكـدی بكـەوێ پێی دەگـوترێ: (مُبَاشَرَة)، بـەلام لێـرەدا مەبەسـت پێكـەوە جووتبوونـه، جـا دەفـەرموێ: لـه كاتێكـدا كـه لـه

ئیعتیکـاف دان لـە مزگەوتەکانـدا، لەگـەڵ هاوسـەرانتاندا جـووت مـەبن، واتـە: دروسـت نیـە ئینـسانی خەڵوەکـێش (مُعْتَكِف) لەگـەڵ هاوسـەری جـووت بـێ، چـونکە زۆر لـە زانایـان دەڵـێن: مـەرجی ئیعتیکـاف ئەوەیـە کـە ئینـسان بەڕۆژووبـێ، جـا مانـای وایـە تـۆ ڕۆژووەکەشـتو ئیعتیکـافەکەشت دەشکێ، وە ئەگـەر مـەرجی ئیعتیکـاف بـەڕۆژووبوونیش نـەبێ، وەك لـەلای زۆر لـە شەرعـزانان دەڵـێن: مـەرج نیـە ئینـسان بـەڕۆژوو بێـت، بـەڵکو دەتوانـێ بـۆ سەعاتێکیش بچێتە ئیعتیکاف، ئـەوە بـە تەئکیـد جووتبـوون لەگـەڵ خێزانـدا، پێچەوانەی ئیعتیکافە، چونکە ئیعتیکاف ئەوەیـە تـۆ ماوەیـەك خـۆت یەکـلایی بکەیتەوە، بۆ ڕامان (تأمُّل)و بیـرکردنەوە لـە سیفاتەکانی خـوای پەروەردگـارو قورئـان خوێنـدنو پاڕانـەوەو، لـە خـوا نزیکـبوونەوەی زیـاتر، کـە دیـارە جووتـبوون لەگـەڵ ئافرەتـدا لەگـەڵ ئەوانەدا ناگونجـێ.

<u>**مەسـەلەی یازدەیـەم:**</u> خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ تِلْكَ حُدُودُ اللَّهِ فَلَا تَقْرَبُوهَا ﴾، ئەوانە سنوورەکانی خوان توخنیان مەکەون لێیان نزیـك مەبنـەوە، بـەڵام هـەر لە سوورەتی (البقرة)دا لە شوێنێکی دیکـەدا، دەفـەرموێ: ﴿ ... تِلْكَ حُدُودُ اللَّهِ فَلَا تَعْتَدُوهَا ... ﴿٢٢٩﴾ ﴾، ئەوانـە سـنوورەکانی خـوان مەیانبـەزێنن، جـا ئایـا لێـرە بۆچی وا دەفەرموێ؟ چـونکە باسـی غـەریزەی جینـسییەو ئـەو ئـارەزووەش لـە ئینـسانـدا زۆر بـەهێزەو، ئینـسـان هـەر ئەوەندەیـە لێـی نزیـك کەوتـەوە، دوایـی دەخلیـسکێ بۆیــە، دەفــەرموێ: ﴿ فَلَا تَقْرَبُوهَا ﴾، ئــەو شــتانەی کــە بــە لێنـیزیکبوونەوەیان ئینسان دەخلیسکێنن، دەبێ لێیـان نزیك نەبێتـەوە، بـەڵام بۆ شتی دیکە دەفـەرموێ: سنوورەکـانیان مەبـەزێنن، واتـە: هـەر سنوورەکـەیـان نەشکێنن قەیدێنـاکـات، بەڵام لـێرەدا دەفەرموێ: هەر توخنـی مەکەوە، چونکـە ڕەنگە هەر توخنی بکەوی دوایی بخلـیسکێیو خـۆت بـۆ نەگیـرێتەوە، ئـەوەش هـەمووی لـە وردیـیو لـە ڕەوانبیـژیی کـتێبی خوایـە، کـە بـۆ هـەر شـوێنە وشـەیـەكو تەعبیـرێك بەکـاردێنێ، کـە لەگەڵ ئەوێـدا بگونجـێ.

**مەسەلەی دوازدەیەم:** ئەگەر كەسێك بەڕۆژوو بوو لەبیری چۆوە ئاوی خواردەوە، یان شتێكی خوارد، ئایا ئەوە هیچ زیانی پێدەگەیەنێ؟ نەخێر، ئەوە هیچ زیانی پێ ناگەیەنێ، بە بەڵگەی ئەم فەرموودەیە: {(عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسولَ اللهِ ﷺ مَنْ نَسِيَ وَهُوَ صَائِمٌ، فَأَكَلَ أو شَرِبَ، فَلْيُتِمَّ صَوْمَهُ، فَإِنَّمَا أَطعَمَهُ اللهُ وَسَقَاهُ) (مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ، البُخَارِيُّ برقم: (٦٦٦٩)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٢٧٠٩) وَاللَّفْظُ لَهُ}، واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەركەسێك لەبیری چوو بەڕۆژوو بوو، شتێكی خوارد یان شتێكی خواردەوە، با ڕۆژووەكەی تەواو بكات، ئەوە خوا ئەو خواردنو خواردنەوەی داوەتێ. واتە: مادام لەبیری چووبێ ئەوە ڕۆزییەكە خوا پێی، داوەو خەڵاتی كردوەو ڕۆژووەكەشی زیانی نەهێناوە.

**مەسەلەی سێزدەیەم:** زانایان هەموو لەسەر ئەوە یەك دەنگن، كە هەر كەسێك لەكاتێكدا بەڕۆژوویە، لە مانگی ڕەمەزاندا بچێتە لای خێزانی، واتە: لەگەڵیدا جووت بێت، ئەوە هیچ كە ڕۆژووەكەی بەتاڵ بۆتەوە، لەسەری فەرزە كە كەفارەتیش بدات، كەفارەتەكەشی ئازادكردنی كۆیلەیەكە، یان دوو مانگ لەسەر یەك بەڕۆژوو بێ، یاخود نانی شەست (٦٠) نەدار بدات، هەر ڕۆژەی هی ژەمێك[١].

**مەسەلەی چواردەیەم:** كە دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تَأْكُلُوٓاْ أَمْوَٰلَكُم بَيْنَكُم بِٱلْبَٰطِلِ وَتُدْلُواْ بِهَآ إِلَى ٱلْحُكَّامِ لِتَأْكُلُواْ فَرِيقًا مِّنْ أَمْوَٰلِ ٱلنَّاسِ بِٱلْإِثْمِ وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴾، لێرەدا كە دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تَأْكُلُوٓاْ أَمْوَٰلَكُم ﴾،ماڵی خۆتان مەخۆن، بە تەئكید مەبەست پێی ماڵی یەكدییە، بەڵام بۆچی نافەرموێ: (ولايَأكُل بَعضكم مال بعض)؟ بۆ ئەوەی وەبیرت بێنێتەوە، كە ماڵی خوشكو برا مسوڵمانەكەت كە دەیخۆی، وەك هی خۆت وایەو، كە زیان بەو دەگەیەنی بە خۆتت

---

١) سەرچاوەی پێشووتر، ج: (٢)، ص: (٥٤١).

گەیاندوە، ئەگەر ڕاست بکەی لەگەڵ مسوڵمانەتییتدا، چونکە ئەویش وەك خۆت وایەو تۆش وەك ئەوی.

**مەسەلەی پازدەیەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ وَتُدْلُوا۟ بِهَآ إِلَى ٱلْحُكَّامِ لِتَأْكُلُوا۟ فَرِيقًا مِّنْ أَمْوَٰلِ ٱلنَّاسِ بِٱلْإِثْمِ وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴾، ئەوە دەگەیەنێ کە ئەوانەی چاویان لە بەرتیلدانە بۆ ئەوەیە ماڵی خەڵك بەناهق بخۆن، وە ڕیشوەتو بەرتیلدان بە دادوەرەکانو بە دەسەڵاتدارو بە کاربەدەستەکان، ڕێیەکی زۆر زانراوو ناوداری ماڵی خەڵك بەناهەق خواردنە، بەڕاستیش هەروایەو زۆر کەس دەعوایەکی ناهەقی هەیە، بەڵام دەچێ دەمی دادوەرو کاربەدەستەکان چەور دەکاتو، ماڵی مەزڵوومێك کە هەقی خۆیەتی لێی دەپچڕێ، بەهۆی ئەو بەرتیلەوە، وەك لە کوردەواریی خۆماندا دەڵێن: (بەرتیل بەرد نەرم دەکا)! دیارە مەبەست پێی ئەوەیە، کەسێك لە بێ ئینصافییدا دڵی وەك بەرد یاخود لە بەردیش ڕەقتربێ، بە بەرتیل نەرم دەبێ، ئەگەرنا کەسێك خاوەنی ئینصافو ویژدان بێو ئیمانی هەبێ، بەدڵنیایی چاوی لەوە هەرنیە کە بەرتیلو (رشوة) وەربگرێ.

**مەسەلەی شازدەیەم:** ماڵی خەڵك خواردن بەهۆی بەرتیلدانەوە، یەکێکە لەو شتانەی کە خوا قەدەغەی کردوە، وەك (عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو) خوا لێی ڕازی بێ گێڕویەتیەوە: ﴿(لَعَنَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ الرَّاشِيَ وَالْمُرْتَشِيَ) (رَوَاهُ التِّرمِذِيّ برقم: (١٣٣٧)، وقَالَ: هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَقَالَ الألباني في (الإرواء) برقم: (٢٦٢١)، و رَوَاهُ أبو بكر في (زاد المسافر) وزاد: (وَالرائِشَ)، صَحِيح باللَّفظ الأول)، واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ نەفرینی کردوە لە کەسێك کە بەرتیل دەداتو کەسێك کە بەرتیل وەردەگرێتو، کەسێك کە لەنێوانیاندا دێتو دەچێت دەڵاڵەو بەرتیلدەرو بەرتیلوەرگر پێکدێنێ، بۆ ئەوەی ماڵی مەزڵوومێك لەبەین بچێ، پێغەمبەر ﷺ نەفرەت (لعنة)ی لە هەرسێکیان کردوە.

**مەسەلەی حەفتەیەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلۡأَهِلَّةِۖ قُلۡ هِيَ مَوَٰقِيتُ لِلنَّاسِ وَٱلۡحَجِّ ﴾، پرسیارت لێدەکەن دەربارەی مانگە تازەبووەوەکان، چونکە (هلال) بە مانگی یەك شەوەو دوو شەوە دەگوترێ، جا دیارە پرسیاریان کردوە کە بۆچی مانگ پێشێ وەك دەمی داس وایەو دوایی وردە وردە گەورە دەبێ، کەچی خوا ﷻ بە جۆرێکی دیکە وەڵامیان دەداتەوە، کە ئەوە پێی دەگوترێ: وەڵامێکی کاربەجێیانە، چونکە: ئەوان لەڕووی فەلەکییەوە پرسیار دەکەن، کە بۆچی مانگ ئاوا یەك شەوەیەو دوو شەوەیەو ... هتد، بەڵام خوا ﷻ ئەوەیان بۆ ڕوون دەکاتەوە، کە حیکمەتی ئەوە کە مانگ یەك شەوەو دوو شەوەیەو سێ شەوەیە، تا کۆتایی، ئەوەیە کە ببێتە مایەی ژماردنو حیسابکردنو دیاریکردنی کاتو مەوعیدەکانی دینداریی‌و دنیاداریی.

**مەسەلەی هەژدەیەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلۡأَهِلَّةِۖ قُلۡ هِيَ مَوَٰقِيتُ لِلنَّاسِ وَٱلۡحَجِّ ﴾، زانایان دەڵێن: ئەم پرسیارو وەڵامە ئەوەی لێوەردەگیرێ، کە ئەوان پرسیارێکیان لە پێغەمبەر ﷺ کردوە، کە ئایا بۆچی مانگ ئاوایەو ئاوایە؟ کە وەڵامەکەی لەڕێی وەحییەوە نازانرێ، بەڵکو لەڕێی زانستی گەردووناسیی یەوە، کە ئینسان بە عەقڵو ئەزموونی خۆی دەتوانێ بەدەستی بێنێ، دەزانرێ، بەڵام پێغەمبەر ﷺ زانیاری وەحی بە ئێمە ڕادەگەیەنێ کە تەنیا خوا دەیزانێو لەڕێی عەقڵەوە نازانرێ، کەواتە: ئێوە پرسیارێکتان کردوەو داوای وەڵامێکتان لە پێغەمبەر ﷺ کردوە، کە لەڕاستیدا لە بواری پسپۆڕیی (إختصاص)ی ئەودا نیە، ئێوە پرسیاری شتێکی لێبکەن کە لەڕێی وەحییەوە نەبێ نەیزانن، بەڵام ئەوەی لەڕێی عەقڵو زانستی خۆتانەوە دەتوانن بەدەستی بێنن، پرسیار لە پێغەمبەر ﷺ مەکەنو بۆخۆتان هەوڵدەن وەڵامەکەی بەدەست بێنن.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی سی و نۆیەمین

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان لە ئایەتی ژمارە (١٩٠ تاكو ١٩٥) لە سوورەتی (البقرة) دەگرێتە خۆی، لەم شەش ئایەتەدا خوا ﷻ باسی جەنگ و جیهاد لە پێناوی خۆیدا دەكات، وە فەرمان بە مسوڵمانان دەكات كە لە پێناویدا بجەنگن، وە خۆیان لە بەزاندنی خەتی سوور بپارێزن، واتە: تووشی ناشەرعیی و هەڵەو پەڵە نەبن، ئەو شەش ئایەتە لەوبارەوەو چەند مەسەلەیەكی دیكەی پەیوەست بەو بابەتەوە، دەدوێن، وەك: جەنگ نەكردن لە مزگەوتی حەرامدا مەگەر لەحاڵەتی شەر پێفرۆشراندا، جەنگ كردن بەمەبەستی نەمانی ئازارو ئەشكەنجەدران و دەستدرێژیی ئەهلی كوفر، بەرپەرچدانەوەی دەستدرێژیی و تۆڵەستاندنەوە بۆ تێپەڕاندن ماڵ و سامانی بەخشین لەرێی خوادا...

﴿ وَقَٰتِلُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ٱلَّذِينَ يُقَٰتِلُونَكُمۡ وَلَا تَعۡتَدُوٓاْۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُعۡتَدِينَ ﴿١٩٠﴾ وَٱقۡتُلُوهُمۡ حَيۡثُ ثَقِفۡتُمُوهُمۡ وَأَخۡرِجُوهُم مِّنۡ حَيۡثُ أَخۡرَجُوكُمۡۚ وَٱلۡفِتۡنَةُ أَشَدُّ مِنَ ٱلۡقَتۡلِۚ وَلَا تُقَٰتِلُوهُمۡ عِندَ ٱلۡمَسۡجِدِ ٱلۡحَرَامِ حَتَّىٰ يُقَٰتِلُوكُمۡ فِيهِۖ فَإِن قَٰتَلُوكُمۡ فَٱقۡتُلُوهُمۡۗ كَذَٰلِكَ جَزَآءُ ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴿١٩١﴾ فَإِنِ ٱنتَهَوۡاْ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴿١٩٢﴾ وَقَٰتِلُوهُمۡ حَتَّىٰ لَا تَكُونَ فِتۡنَةٞ وَيَكُونَ ٱلدِّينُ لِلَّهِۖ فَإِنِ ٱنتَهَوۡاْ فَلَا عُدۡوَٰنَ إِلَّا عَلَى ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٩٣﴾ ٱلشَّهۡرُ ٱلۡحَرَامُ بِٱلشَّهۡرِ ٱلۡحَرَامِ وَٱلۡحُرُمَٰتُ قِصَاصٞۚ فَمَنِ ٱعۡتَدَىٰ عَلَيۡكُمۡ فَٱعۡتَدُواْ عَلَيۡهِ بِمِثۡلِ مَا ٱعۡتَدَىٰ عَلَيۡكُمۡۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلۡمُتَّقِينَ ﴿١٩٤﴾ وَأَنفِقُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَلَا تُلۡقُواْ بِأَيۡدِيكُمۡ إِلَى ٱلتَّهۡلُكَةِ وَأَحۡسِنُوٓاْۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴿١٩٥﴾ ﴾.

## مانـای وشـە بە وشـەی ئایەتەکـان

((وە (ئەی بڕوادارینـە) ! لـەڕێی خـوادا بجەنگن لەگـەڵ ئەوانـەدا، کـە جەنگـتان لەگـەڵ دەکـەن، بـەڵام دەسـتدرێژیی مەکـەن، بێگومـان خـوا دەسـتدرێژکارانی خۆشناوێن ﴿١٩٠﴾ وە لە هەر کوێیەك بەر پەلتان کەوتن بیانکوژن، وە وەدەریان بنێن لـەو شـوێنەی کـە ئێوەیـان لـێ وەدەرنـاوە، وە ئـازارو ئەشکـەنجەدان (ی بـڕواداران لەلایەن کافرانەوە بۆ ڕێگریی لـێ کردنیان لە ئیمان) لە کوشتن خراپتـرە، وە لەلای مزگەوتی حەرام جەنگیان لەگـەڵ مەکـەن، هەتـا لەوێدا لەگـەڵتان دەجەنگـن، جـا ئەگەر لەوێ لەدژتان جەنگین بیانکوژن ئا ئەوەیە سزای بێبڕوایان ﴿١٩١﴾ ئنجا ئەگـەر دەستیان هەڵگرت (لە جەنگ‌و کوشتار) ئەوە بێگومان خوا لێبوردەی بە بەزەیی یـە ﴿١٩٢﴾ وە لە دژیان بجەنگن هەتا ئازارو ڕێگرییان نامێنـێ‌و، ملکەچیی تـەنیا بـۆ خـوا دەبێ، جا ئەگەر وازیان هێنا، ئەوە جگە لە ستەمکاران دەستدرێژیی ناکرێتە سـەر کەس ﴿١٩٣﴾ شکاندنی مانگی حەرام بە شکاندنی مانگی حەرامەو قەدەغەکراوەکانیش تۆڵـەیـان تێدایە، جا هەر کەس دەستدرێژیی کردە سەرتان، وەك دەسـتدرێژییەکەی خۆی دەسـتدرێژیی بکەنەوە سـەر، وە پارێز لە خـوا بکـەن‌و بـزانن کـە خـوا لەگـەڵ پارێزکاران دایە ﴿١٩٤﴾ وە لە پێناوی خـوادا (مـاڵ‌و سـامانتان) ببەخـشن‌و بـە دەسـتی خۆتـان خـۆ مەفـەوتێنن (بـەهۆی ڕژدییـەوە) وە چـاکە بکـەن، بێگومـان خـوا چاکەکارانی خۆش دەوێـن ﴿١٩٥﴾)).

## شـیکردنـەوەی هەندێـك لە وشـەکان

(﴿وَقَٰتِلُواْ﴾): (المُقاتَلَةُ: المُحارَبَةُ وَ تحَرِّي القَتل)، وشـەی (مُقاتَلَةُ) واتـە: جـەنگ کردن‌و خەفـتان بۆ ئەوەی بەرانبەرەکـەت بکوژی.

(﴿سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾): (السَّبيلُ: كُلُّ ما يُتَوَصَلُ بِهِ إلَى شَيءٍ كَانَ خَيْرَاً أَوْ شَرَّاً)، وشـەی (سَبِيلُ) واتە: هەر هۆکارێك کە لێیـەوە دەگـەی بە شـتێك، جا ئەو شـتە خێـر

بێ یان شەڕ، (في سَبِيل الله) واتە: لە ڕێگای خـوادا، لە پێناوی خـوادا.

(وَلَا تَعْتَدُوٓا۟): (الإعتِداءُ: مُجاوَزَة الحَقّ)، وشەی (إعتِداءُ) واتە: لە هەق تێپەڕێنیو سنوور ببەزێنی.

(ثَقِفْتُمُوهُمْ): (الثَقِفُ: الحِذق في إدراكِ الشَيءِ، وفِعلُه وُهَوَ مُطلَقُ الإدراكِ)، وشەی (ثَقِف) واتە: شتێك بەوریاییو بە لێزانیی وەدەستبخەی، چونکە ئەسڵی وشەی (ثَقِف): بریتییە لە وردەکارییکردن لە دەست گەیاندنە شتێك.

(حَيْثُ): (حَيْثُ: عِبارةٌ عَن مَكانٍ مُبْهَمٍ يُشْرَحُ بِالجُملَةِ الَتي بَعْدَهُ)، وشەی (حَيْثُ) بریتیە لە شوێنێکی نادیار کە ئەو ڕستەیەی لە دوای دێ شەرحی دەکات، وە وشەی (حَيْثُ) بۆ ناوی شوێنو حاڵو کات، بەکاردەهێنرێ.

(وَٱلْفِتْنَةُ): (أَصْلُ الفَتْنِ إدخَالُ الذَّهَبِ النَّارُ لِتَظْهَرَ جَوْدَتَهُ مِن رَدَائَتِهِ، والفِتَنَةُ بِمَعْنَى الإختِبارِ وَ البَلاءِ وَ العَذَابِ لأَنَّهَا سَبَبُهُ)، وشەی: (فِتنة) ڕیشەکەی لە (فَتْن)ەوە هاتوە، (فَتْن)یش بریتیە لەوەی کە زێڕ بخرێتە نێو ئاگر، تاکو دەرکەوێ داخۆ چۆنە؟ زێڕی ساغە یاخود ناساغەو شتی دیکەی لەگەڵ خراوە، وە وشەی (فِتْنَة) بەمانای تاقیکردنەوە دێ، وە بەمانای بەڵاو، بەمانای ئازارو ئەشکەنجەش دێ، چونکە بەهۆی ئەوەوە پەیدا دەبێت، واتە: ئەو ئازارو ئەشکەنجەیە بەهۆی ئەو تاقیکرانەوەوە پەیدادەبێ.

(جَزَآءُ): (الجَزاء: الغَناء والكِفاية: والجَزاء: ما فيهِ الكِفَاية مِنَ المقابلَةِ، خَيَراً أَو شَراً) واتە: (جَزَاء) بریتیە لە شتێك کە بەرانبەر شتێك بێتو هاوکوف بێ بۆی، وە (جَزَاء): هەرشتێکە کە بەرانبەری شتێکی تێدابێ، جا ئەو بەرانبەرەی خێر بێ یان شەڕ بێ، واتە: وشەی: (جَزَاء) هەم بۆ پاداشتی خێرو هەم بۆ هی شەڕ بەکاردێت.

(عُدْوَٰنَ): (وَهُوَ بِمَعنى مُجاوَزِةِ الحَدِّ)، (عدوان) واتە: سنوور بەزێنیی، سنوور شکاندن.

(ٱلشَّهۡرُ ٱلۡحَرَامُ): واتــە: مــانگی قەدەغــە، (الحَـرَام: الـمَمْنُوعُ مِنْـهُ قَـدَرَاً أَو شَرعَـاً أَو عَقلاً) واتە: حەرام هەر شتێكە كـە ئینسانی لـێ قەدەغە كرابێ، بە قەدەر، یان بە شــەرع، یان بە عەقڵ، مانگــە حەرامەكتانیش ئەو مانگــانەن كە جەنگیان تێدا قەدەغەكراوە، جا ئایا ئێستاش هەر تیایانـدا قەدەغـەكراوە، یاخود ئـەو حوكمە بۆ كاتی خـۆی بووە؟ ئەوە مشتومڕی لە نێوان زانایان لەسەرە، مانگــە حەرامەكــانیش بریتین لە: (رَجَب، ذوالقَعدَة، ذوالحِجَة، مُحَرّم).

(وَٱلۡحُرُمَٰتُ قِصَاصٌ): (حُرُمَــات) كــۆی (حُرْمَــة)یــە، (الحُــرْمَة: هِــيَ مَــالاَ يَحِــلُ انتِهاكُـهُ مِن ذِمَةٍ أَو حَقٍ أَو صُحبةٍ) واتە: (حُرْمَة) هەرشـتێكە كـە ڕەوا نـەبێ دەسـتلرێژیی بكرێتە سەر، لە پـەیمان و هـەق و مـاف و هاوەڵایـەتیی، وە مانـای: (وَالْحُـرُمَات قِـصَاص)، واتــە: حورمەتــەكان تۆڵــەیان تێدایــەو، هەركەســێ حورمەتی كەسێكی شكاند، ئەویش بۆی هەیـە كە تۆڵەی لـێ بكاتەوە.

(ٱلتَّهۡلُكَةِ): (التَهـلُكَة: مَايُـؤَدّي إِلَـى الـهَـلاَكِ وَهُـوَ الفَـنَـاءُ أَو الفَـسـادُ أَو الْمَـوْت)، (تَهْلُكَـة) واتـە: هەرشـتێك ببێتـە هـۆی فـەوتانی ئینـسـان، (هَـلاَكِ)یـش یـان فەوتانە، یان تێكچوونە، یاخـود مردنــە.

## هـۆی هاتنــە خــوارەی ئەم ئایەتەكــان

١) هـۆی هــاتنە خـوارەوەی ئـەو ئایەتـەی، كـە دەفـەرموێ: ﴿ وَقَٰتِلُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ٱلَّذِينَ يُقَٰتِلُونَكُمۡ... ﴾، {(عَـن ابـنِ عَبَّـاسٍ رضي الله عنه: نَزَلَـتْ هَـذِهِ الأيَـات فـي صُلحِ الحُدَيْبِيَة، وَذَلِكَ أَنَّ رَسولَ اللهِ ﷺ لَمَّا صُدَّ عَن البَيـتِ هُوَ وَأَصحابُهُ نحر الـهَدِيَ بالحُدَيْبِيَة، ثُمَّ صَالحهُ المشرِكُونَ عَلَى أَنْ يَرجِعَ عَامَهُ، ثُمَّ يَأتِي القَابِل، عَلَى أَنْ يُخْلُوا لَـهُ مَكّة ثَلاَثَةَ أَيَام، فَيَطُوف بالبَيتِ وَ يَفعَل مَا يَشَآءَ، وَصَالَحَهُم رَسولُ اللهِ ﷺ فَلَمَّا كَانَ العَام المُقبل تَجَهَّزَ رَسول الله ﷺ هُوَ وَأَصحَابُهُ لِعُمرَةِ القَضَاءَ، وَخَافـوا أَنْ لاَ تفـي لَهُـم قُـريش بِـذَلِكَ، وَأَنْ

يَصُدُّوهُم عَنِ المَسْجِدِ الحَرَامِ ويُقَاتِلُوهُم، وَكَرِهَ أصحَابُهُ قِتَالَهُم فِي الشهرِ الحَرَامِ فِي الحَرَمِ، فأنزَلَ اللهُ تَعالى: ﴿ وَقَٰتِلُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ٱلَّذِينَ يُقَٰتِلُونَكُمۡ ... ﴾، يَعني قُرَيشَاً) (أسبَاب النزول للنيسابوري، ص (٣٧)}، واته: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس خوا لە خۆی و بابی ڕازی بێ دەڵێ: ئەم ئایەتانە لە ڕێککەوتنی حودەیبیەدا هاتنە خوار، {صوڵحی حودەیبیەش لەوەدا ڕوویدا کە پێغەمبەر ﷺ لە ساڵی شەشەمی کۆچیدا خۆی و هەزارو چوارسەد (١٤٠٠) کەس لە هاوەڵانی بەڕێزی چوون کە عومرە بکەن، بەڵام هاوبەش پەرستەکانی مەککە ڕێیان پێگرتن، وە سەرەنجام صوڵحێکی لێکەوتەوە، کە بە ڕێککەوتنی حودەیبیە ناوزەدکرا}، وە پێغەمبەر ﷺ خۆی و هاوەڵانی ئەو قوربانیانەی کە پێیان بوون، لەوێ سەریان بڕین و ئیحرامیان شکاند، ڕێککەوتنەکەش وابوو کە ئەم ساڵە (واته: ساڵی شەشەم) بگەڕێنەوەو عومرە نەکەن، بەڵام ساڵی داهاتوو (واته: ساڵی حەوتەمی کۆچی) پێغەمبەر ﷺ خۆی و هاوەڵانی بێن وە کافرەکانی مەککە، مەککەی بۆ چۆڵ بکەن بۆ ماوەی سێ ڕۆژان، طەواف بکەن و عومرەی خۆیان بکەن، جا ئەوە بوو پێغەمبەر ﷺ ساڵی ئاینده (واته: ساڵی حەوتەم) خۆی و هاوەڵانی بەڕێزی چوون بۆ ئەوەی ئەو عومرەیە بگێڕنەوە بۆیەش ناوی لێنرا: (عُمرَة القَضَاء)، واته عومرەی گێڕدراوە، جا مسوڵمانان مەترسییان هەبوو کە قوڕەیشییەکان ئەو بەڵێنەی خۆیان نەبەنە سەرو شەڕیان پێ بفرۆشن و بیانگێڕنەوە لە مزگەوتی حەرام و لەگەڵیان بجەنگن، ئەوانیش پێیان ناخۆشبوو لە مانگەکانی حەرامدا، وە لە حەرەمدا (واته: حەرەمی مەککە) تووش جەنگ ببن، ئیدی خوای بەرز ئەم ئایەتانەی ناردنە خوار، {کە ئەگەر تووش بوون، ئەوە ئاوی لێ مەخۆنەوەو ئەو جەنگە سەپێنراوە بکەن}.

٢) هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو ڕستەیە، کە دەفەرموێ: ﴿ٱلشَّهۡرُ ٱلۡحَرَامُ بِٱلشَّهۡرِ ٱلۡحَرَامِ ... ﴾، {(قَالَ قَتَادَةَ: أقبَلَ نَبِيُّ اللهِ ﷺ وَأصحَابُهُ مُعتَمِرِين فِي ذي القَعدَةَ حَتَّى إذَا كَانوا بالحُدَيْبِيَةَ صَدَّهُم المُشرِكُون، فَلَمَّا كَانَ العَام

الـمقبـل دَخَلـوا مَكَةَ، فاعتَمروا فـي ذي القَعدَة، وَأقاموا بِهَا ثَلاثَ لَيالٍ، وَكَانَ الْمُشرِكُون قَد فَخَروا عَلَيـهِ حِينَ ردوه يَـوم الحُدَيْبِـيَةَ، فأَقَصَّهُ الله مِنْهُم، فـأَنزَلَ: ﴿ٱلشَّهۡرُ ٱلۡحَرَامُ بِٱلشَّهۡرِ ٱلۡحَرَامِ ...﴾) (أسـباب النـزول للنيـسابوري، ص: (٣٧)}، واتـە: نەیـسابووریی لـە قـەتادەوە خـوا لێـی ڕازی بـێ دەگێڕێتـەوە، کـە گوتوویەتی: پێغەمبەر ﷺ خـۆی‌و هاوەڵانی بەڕێزی لە مانگـی (ذي القَعدة)دا چـوون بـەرەو مەککە کـە عـومرە بکـەن، لـە حودەیبیـە هاوبـەش پەرسـتەکان گێڕایاننـەوە، ساڵی داهـاتوو {بـەپێی ڕێککەوتنـی حودەیبیـە} پێغەمبـەر ﷺ و هاوەڵانی چوونە مەککە عومرەیان کرد لە مانگی (ذي القَعدة)داو سێ شەوان لە مەککـە مانـەوە، جـا بـەهۆی ئـەوەوە کـە هاوبـەش دانـەرەکان عومرەیـان لـێ تێکدابوون، کاتێك کە لە ڕۆژی حودەیبیە گێڕایاننەوە خوا تۆڵەی لێ‌ستاندنەوە، وە بەو هۆیەوە ئەم ئایەتـەی نـاردە خـوار: ﴿ٱلشَّهۡرُ ٱلۡحَرَامُ بِٱلشَّهۡرِ ٱلۡحَرَامِ ...﴾.

٣) هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ڕستەیەی کە دەفـەرموێ: ﴿وَأَنفِقُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَلَا تُلۡقُواْ بِأَيۡدِيكُمۡ إِلَى ٱلتَّهۡلُكَةِ﴾.

أ- بوخـاریی ئـەم بەسەرهـاتەی هێنـاوە {(عَنْ حُذَيفَـةَ رضي الله عنه قَـالَ: نَزَلَـتْ فـي النَّفَـقَةِ) (رَوَاهُ البُخَـارِيُّ بـرقم: (٤٥١٦)}، واتـە: حوزەیفـەی یەممـانیی خـوا لێـی ڕازی بێـت دەڵـێ: ئەم ڕسـتە قورئـانییـە دەربارەی مـاڵ سـەرفکـردن هـاتـە خـوار، (کە دوایی باسـی دەکـەین).

ب- هەروەهـا ئـەو گێڕانەوەیـەش هەیـە لەوبـارەوە {(عَنْ أَسْـلَمَ أَبِـي عِمْـرَانَ التُّجِيبِيِّ قَالَ: كُنَّا بِمَدِينَـةِ الـرُّومِ فَأَخْرَجُـوا إِلَيْنَـا صَفًّا عَظِيمًـا مِنْ الـرُّومِ فَخَرَجَ إِلَيْهِـمْ مِنْ الْمُسْلِمِينَ مِثْلُهُـمْ، أَوْ أَكْـثَرُ، وَعَلَـى أَهْلِ مِصْـرَ عُقْبَـةُ بْنُ عَامِرٍ وَعَلَـى الْجَمَاعَـةِ فَضَـالَةُ بْنُ عُبَيْـدٍ، فَحَمَـلَ رَجُـلٌ مِنْ الْمُسْلِمِينَ عَلَـى صَفِّ الـرُّومِ حَتَّـى دَخَـلَ فِيـهِمْ، ثُمَّ خَـرَجَ إِلَيْنَـا مقبلاً فَصَـاحَ النَّـاسُ وَقَـالُوا: سُبْحَانَ اللهِ يُلْقِـي بِيَدَيْـهِ إِلَـى التَّهْلُكَـةِ، فَقَـامَ أَبُو أَيُّـوبَ الْأَنْصَـارِيُّ، فَقَـالَ:

يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّكُمْ تَتَأَوَّلُونَ هَذِهِ الْآيَةَ عَلَى غَيْرِ التَّأْوِيلِ، وَإِنَّمَا أُنْزِلَتْ هَذِهِ الْآيَةَ فِينَا مَعْشَرَ الْأَنْصَارِ لَمَّا أَعَزَّ اللَّهُ الْإِسْلَامَ وَكَثُرَ نَاصِرُوهُ، فَقَالَ بَعْضُنَا لِبَعْضٍ سرا دُونَ رَسولِ اللَّهِ ﷺ إِنَّ أَمْوَالَنَا قَدْ ضَاعَتْ، وَإِنَّ اللَّهَ قَدْ أَعَزَّ الْإِسْلَامَ وَكَثُرَ نَاصِرُوهُ فَلَوْ أَقَمْنَا فِي أَمْوَالِنَا فَأَصْلَحْنَا مَا ضَاعَ مِنْهَا، فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَلَى نَبِيِّهِ ﷺ يَرُدُّ عَلَيْنَا مَاقُلنا، فَقَالَ: ﴿ وَأَنفِقُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَلَا تُلۡقُواْ بِأَيۡدِيكُمۡ إِلَى ٱلتَّهۡلُكَةِ... ﴾ فَكَانَت التَهلُكَة الإقامَة الأموَال وَإصلاحُهَا وتَرَكُنَا الغَزو فَمَازالَ أبو أيُّوب شاخصاً في سَبيلِ الله حَتَّى دُفِنَ بأرضِ الرُوم) (رَوَاهُ التِّرمِذِيُّ برقم: (٢٩٧٢)، وقَالَ: حَديثٌ حَسَنٌ صَحيحٌ غريب، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٢٥١٢)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٤٧١١)، والصحيح المُسند مِن أسباب النزول لمقبل بن هادي الوادعي ص: (٣٤)، وَصَحَّحَهُ الألباني في (سُنن أبي داود)}، ئەم ڕستە قورئانیە کە زۆر کەس بە هەڵە لە غەیری شوێنی خۆیدا بەکاری دێنێت کە ئایەتەکە دەفەرموێ: ﴿ وَأَنفِقُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَلَا تُلۡقُواْ بِأَيۡدِيكُمۡ إِلَى ٱلتَّهۡلُكَةِ وَأَحۡسِنُوٓاْۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴾، لە ڕێی خوداماڵی خۆتان خەرج بکەن وە بەدەستی خۆتان خۆتان مەفەوتێنن ، وە چاکە بکەن خوا چاکەکارانی خۆشدەوێن.

ئەوە (أسلم أبو عمران التجُيبِّي) ئاوا دەگێڕێتەوە، دەڵێ: ئێمە لە شاری ڕۆم بووین {مەبەستیان پێی (قسطنطينية) بووە، کە (ئەستەنبوڵ)ی ئێستایە، واتە: لەدەوری شاری ڕۆم بوونو ویستوویانە بیگرن} ڕۆمەکان ڕیزێکی گەورەیان، {واتە: سوپایەکی گەورەیان بۆ دەرنایین بۆمان هاتنە دەرێی شار} لە مسوڵمانانیش سوپایەکی بەقەد خۆیان یاخود زیاتر بۆیان چوونە دەرێ، کە ئەو بەشە سوپایەی لە میسرەوە هاتبوو عوقبەی کوڕی عامر سەرکردەی بوو، وە سەرکردەی هەموو سوپاکە (فَضالَة)ەی کوڕی (عُبيد) بوو خوا لێیان ڕازی بێ، دەڵێ: پیاوێك لە مسوڵمانان هێرشی کردە نێو سوپای ڕۆم

هەتاکو چووە نێویانو لە نێویاندا ونبوو (واتە: بەتەنیا چوو) خەڵکەکەش هاواریان کرد گوتیان: (سُبحانَ الله) بەدەستی خۆی خۆی فەوتاند، ئەبو ئەییوبی ئەنصاری {کە یەکێکە لە هاوەڵانی بەڕێزی پێغەمبەر ﷺ لەوێ بوو، لەوجەنگە بەشداربوو}، گوتی: ئەی خەڵکینە! ئێوە ئەم ئایەتە بەم جۆرە تەفسیر دەکەن، بەڵام ماناکەی وانیە. {کە ئینسان لە ڕێگای خودا ئازایەتی بنوێنێو غیرەت بنوێنێ خۆی بخاتە ڕیزی دوژمنانەوە! ئەو ئایەتەی بەسەردا بچەسپێنیو بەدەستی خۆی خۆی فەوتاندبێ}، بەڵکو ئەم ئایەتە دەربارەی ئێمەی پشتیوان (الأنصار) هاتە خوار، {جا باسی دەکات چۆن؟} کاتێ خوا ئیسلامی بەهێزکرد وە پشتیوانی ئیسلام زۆربوونو ئیسلام بڵاوبووەوە، ئێمە {واتە: وەك پشتیوانان، خەڵکی مەدینە} لە نێوان خۆماندا بێ ئەوەی پێغەمبەر ﷺ پێی بزانێ، بە پەنهانیی بەیەکترمان گوت: ماڵو سامانەکەمان زۆری فەوتا {واتە: نەیان پەرژاوەتە سەر کشتوکاڵو ئاژەڵداریی لەبەر جەنگ} ئێستاش ئیسلام بەهێزبووەو پشتیوانی ئیسلام زۆر بوون، ئەگەر دەست بکەینەوە کارو کەسابەتو ماڵو سامانی خۆمانو ئەوەی فەوتاوە چاکی بکەینەوە {ڕەزو باغەکانمان}، ئێمە ئەو قسانەمان لەنێوانی خۆماندا کرد بە پەنهانیی، {بەڵام دیارە خوای بەرزو مەزن لە سەرووی حەوت ئاسمانەوە بیستوویەتی} خوا ئەم ئایەتەی نارده سەر پێغەمبەرەکەی خۆی ﷺ و بەرپەرچی قسەکەی ئێمەی دایەوە، فەرمووی:

﴿ وَأَنفِقُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَلَا تُلۡقُواْ بِأَيۡدِيكُمۡ إِلَى ٱلتَّهۡلُكَةِ ﴾، جا ئەبو ئەییوب دەڵێ: ئەو (تَهْلُكَة)یەی کە خوای بە بەزەیی ئێمەی لێ ئاگادار کردەوە کە خۆمانی نەخەینە نێو، بریتی بوو لەوەی خەریکی کۆکردنەوەی سامانو دارایيو چاککردنی ماڵو سامانەکانمان بین، {کەواتە: خوای زاناو شارەزا دەفەرموێ: ماڵی خۆتان سەرف بکەن لە پێناوی خوادا بۆ بەرێوەبردنی جەنگو جیهاد، وە خۆتان مەفەوتێنن بەهۆی ئەوەوە کە ماڵەکەتان سەرف نەکەن، وە واز لە جەنگو جیهاد بێنن، چونکە ئەگەر تۆ بەشداریی جیهاد نەکەی بە

مـاڵو بە نەفس، ئەوكـاتە دوژمـن بەسـەر وڵاتی مسوڵمانانـدا زاڵ دەبێو، نـە خۆت دەبیو نە ماڵەكەت دەبێو، خەڵكیش نابێو، هەموو لایەك دەفـەوتێ !}
جا دەڵێ: ئەبو ئەیيوبی ئەنصاڕیی بەردەوام لـە ڕێـی خـوادا جـەنگی دەكـرد {هـەتا وەسـیەتیشی كـردبوو هەركـات شـەهید بـوو یاخـود وەفـاتی كـرد، لـە نزیكتـرین شوێن لەسـەر زەمینی ڕۆمەوە بە خاكی بسپێرن} وە لەنێو خاكـی ڕۆم دا بـەخاك سپـێردرا، ئێـستاش مەزارگـەی ئـەبو ئـەیيوبی ئەنـصاڕیی دەكەوێتە نێو شاری (ئەسـتەمبووڵ)ی ئێـستا، بـەڵام ئـەو كاتـە لـە بـن دیـواری شووڕایەكەی، واتە نزیكتـرین شوێن لە دوژمنەوە، بە خاكیان سپاردوە.

ج- هـەروەها هـەر دەربـارەی هـۆی هاتنـە خـواری ئـەو ئایەتـەی، كـە دەفـەرموێ: ﴿ وَأَنفِقُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَلَا تُلۡقُواْ بِأَيۡدِيكُمۡ إِلَى ٱلتَّهۡلُكَةِ ﴾ ، ئـــەم دەقـــەش هـــاتوە: {(وَأَخـرَجَ أيضـاً بِسَنَدٍ صَحيح عَن النُّعمَانِ بن بَشِير رضي الله عنه قَالَ: كَانَ الرَّجُلُ يُذنِبُ الذَّنبَ فَيقُولُ: لاَ يَغفِرُ اللهُ لِي فَأَنْزَلَ اللهُ تَعَالَى: ﴿ وَلَا تُلۡقُواْ بِأَيۡدِيكُمۡ إِلَى ٱلتَّهۡلُكَةِ ﴾) (الصحيح المُسند مِن أسباب النزول، لمقبل بن هادي الوادعي، ص (٣٥)، ولَـهُ شَـاهد عَـنِ البَـرَاءَ رضي الله عنه، أخرَجَـهُ الحَـاكم، والطَّبَرَانِـي فـي (الأوسط) برقم: (٥٦٧٢) وَقـالَ: وَرجَالـهُا رجَـالُ الصَحِيح}، واتـە: نوعمـانی كوڕی بەشـیـر (كە یەكێكـە لـە هـاوەڵانی بـەڕێز خـوا لێیـان ڕازی بێ)، دەڵێ: كـاتی خۆی كەسێك كـە گونـاهێكی دەكـرد، دەیگوت: خـوا هـەرگیز لـێم خـۆش نابـێ، خـوای بـەرزیش ئـەم ئایـەتەی نـاردە خـوارەوە، كـە بـەپێی ئـەم هـۆی هاتنـە خوارەوەیە، ماناكـەی ئاوای لـێ دێ: دەسـت لـەخۆتان بەرمـەدەن بـەهۆی گوناهانـەوەو، دەسـت لـە خۆتـان مەشـۆن، بڵـێن: تـازە خـوا لێمـان خۆشنابـێ، چونكە ئەوە خۆ فەوتاندنە، تۆ بە گوناهەكەت نەفەوتاوی، بـەڵام بـەوە كە لـە بەزەیـیو بەخشندەیی ڕەحمەتی خوا بێئومێد دەبی، بەوە دەفەوتێی.

# مانــای گشــتی ئایەتەکــان

سووڕەتی (البقرة) وەك لە دەرسەكانی پێشوودا باسمان كردوە ژمارەیەكی زۆر لە یاساكانی ئیسلامی تێدان، چ ئەوانەی پەیوەندییان بە لایەنی كەسابەت و بازرگانیی و ئابوورییەوە هەیە، چ بەلایەنی باری كەسێتیەوە، چ بە لایەنی عیبادەتەوە، ... هتد، وە لە نێو ئەو یاسایانەدا یاساكانی جەنگ و جیهادیش هەن كە لەم ئایەتانەدان، وە هەندێك لە توێژەرەوانی قورئان دەڵێن: یەكەمین ئایەتێك كە هاتۆتە خوار دەربارەی جەنگ و جیهاد ئەم ئایەتەیە، خوا ﷻ ڕوو لە ئیمانداران دەكات، دیارە كاتی خۆی ڕووی لە ئیماندارانێك كردوە كە لە خزمەت پێغەمبەردا بوون ﷺ و لە مەدینەدا نیشتەجێ بوون، بەڵام دیارە دواندنەكانی قورئان پەردەی كات و شوێن دەدڕن و، ئێستا ئیمانداران لە هەرشوێنێك بن بە هەموو ئایەتەكان قورئان دوێنراون و، هەموو ئەو ئەركانەی كە خوای پەروەردگار خستوونیە سەرشانی مسوڵمانانی یەكەم، دەكەونە سەرشانی هەموویان، بەمەرجێك هەمان هەل و مەرج كە بۆ ئەوان ڕەخساوە، بۆ جێبەجێكردنی ئەو حوكمە شەرعییە، بۆ ئەوانی دیكەش بڕەخسێ، جا خوا دەفەرموێ: ﴿ وَقَٰتِلُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ٱلَّذِينَ يُقَٰتِلُونَكُمۡ وَلَا تَعۡتَدُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُعۡتَدِينَ ﴾، وە لە پێناوی خودا بجەنگن لە دژی ئەوانەی كە لە دژتان دەجەنگن (جەنگتان لەگەڵ دەكەن) بەڵام دەستدرێژیی مەكەن، بێگومان خوا دەستدرێژكەرانی خۆشناوێن، دیارە (و)ی پێش ڕستەی: ﴿ وَقَٰتِلُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ﴾، وەك لەدوای ئەوەش دەفەرموێ: ﴿ وَأَتِمُّواْ ٱلۡحَجَّ وَٱلۡعُمۡرَةَ لِلَّهِ ﴾، واتە: وێڕای ئەو ئەركانەی كە ڕابردن، ئەركێكی دیكەشتان لەسەر شانە ئەی بڕوادارینە ! ئەویش ئەوەیە: وە لەڕێی خوداو لە پێناوی خودا بجەنگن لە بەرانبەر ئەوانەی كە جەنگتان لە دژ دەكەن بجەنگن، بەڵام ﴿ وَلَا تَعۡتَدُوٓاْ ﴾ سنوور شكێنیی مەكەن ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُعۡتَدِينَ ﴾،

بێگومان خوا سنوور شکێنان‌و دەستدرێژکارانی خۆش ناوێن، ﴿وَٱقۡتُلُوهُمۡ حَيۡثُ ثَقِفۡتُمُوهُمۡ وَأَخۡرِجُوهُم مِّنۡ حَيۡثُ أَخۡرَجُوكُمۡ﴾، وە ئەوانەی کە لەگەڵتان دەجەنگن (کافرەکان)، لە هەر شوێنێك بەرپەلتان دەکەون بیانکوژن، وە وەك چۆن ئەوان ئێوەیان لەماڵ‌و حاڵ وەدەرنا ئێوەش {ئەگەر پێویستی کردو دەسەڵاتتان بەسەریان هەبوو بۆتان هەیە کە تۆڵە لەوان بکەنەوەو} لە ماڵ وحاڵ‌و نیشتیمان وەدەریان بنێن ﴿وَٱلۡفِتۡنَةُ أَشَدُّ مِنَ ٱلۡقَتۡلِ﴾، وە ئازاردانی مسوڵمانان لەلایەن کافرانەوە لە کوشتنیان توندترە، واتە: مسوڵمان ئەشکەنجە بدرێ بۆ ئەوەی کافر بێتەوە، خراپترە لەوەی کە بکوژرێ‌و، لە دین هەڵگەڕانەوەی مسوڵمانان بەهۆی ئازارو ئەشکەنجەدانیانەوە، لە کوشتنیان خراپترە ﴿وَلَا تُقَٰتِلُوهُمۡ عِندَ ٱلۡمَسۡجِدِ ٱلۡحَرَامِ حَتَّىٰ يُقَٰتِلُوكُمۡ فِيهِ﴾، بەڵام لەلای مزگەوتی حەرام لەگەڵیان مەجەنگن، مەگەر ئەوان دەستپێشخەریی بکەن‌و لەگەڵتان بجەنگن ﴿فَإِن قَٰتَلُوكُمۡ فَٱقۡتُلُوهُمۡۗ كَذَٰلِكَ جَزَآءُ ٱلۡكَٰفِرِينَ﴾، جا ئەگەر لەگەڵتان جەنگان، ئێوەش بیانکوژن، ئا ئەوەش سزای کافرانە، واتە: دەستپێشخەریی مەکەن بۆ شکاندنی حورمەتی مزگەوتی حەرام، یاخود مانگی حەرام، بەڵام ئەگەر بەرانبەرەکانتان دەستپێشخەرییان کرد ئەوە ناکرێ بڵێی: مانگی حەرامە، یان سەرزەمینی حەرەمە، من شەڕ ناکەم! بەڵکو دەبێ وەڵامی دوژمنان بدەیتەوە، ﴿فَإِنِ ٱنتَهَوۡاْ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ﴾، جا ئەگەر دەستیان هەڵگرت، بێگومان خوا لێبوردەی بە بەزەیی‌یە، واتە: ئەگەر دەستیان هەڵگرت لە کوفر، خوا لێیان دەبووری‌و لەگەڵیان بەبەزەیی یە، وە ئەگەر دەستیان هەڵگرت لە زوڵم‌و ستەم، ئێوەش وەك ئەهلی ئیمان دەتوانن چاوپۆشیان لێ‌بکەن‌و لەگەڵیان بە بەزەیی بن، ﴿وَقَٰتِلُوهُمۡ حَتَّىٰ لَا تَكُونَ فِتۡنَةٞ وَيَكُونَ ٱلدِّينُ لِلَّهِ﴾، وە لەگەڵیان بجەنگن تاوەکو (فِتنـة) نامێنێ، واتە: تاکو ئەهلی کوفر توانایان نامێنێ، مسوڵمانان ئازار بدەن‌و لە ئیسلام هەڵیانبگێڕنەوە، وە ملکەچیی تەنیا بۆ خوا دەبێ، واتە: تا وای

لێ دێ هیچ کەس دەسەڵاتی ئەوەی نابێ خەڵکی بەزۆر کافر بکات، یاخود بە زۆر مسوڵمان بکات‌و، دەسەڵات تەنیا بۆ خوا دەبێ، خواش ﷻ ئازادیی تەواوی بە بەندەکانی داوە، کە ئیمان بێنن، یان ئیمان نەهێنن، ﴿ فَإِنِ انتَهَوْا فَلَا عُدْوَانَ إِلَّا عَلَى الظَّالِمِينَ ﴾، جا ئەگەر دەستیان هەڵگرت، ئەوە تەنیا ستەمکاران دەستدرێژییان دەکرێتە سەر، واتە: مەگەر ستەمتان لێ بکەن، ئەگەرنا بۆتان نیە ئێوە ستەمیان لێ بکەن، دیارە ئێمە دوایی لە چەند مەسەلەیەکی گرنگدا زیاتر ئەم مەسەلانە دەتوێژینەوە، پاشان دەفەرموێ: ﴿ الشَّهْرُ الْحَرَامُ بِالشَّهْرِ الْحَرَامِ وَالْحُرُمَاتُ قِصَاصٌ ﴾، مانگی حەرام ئەگەر حورمەتی بشکێندرێ لەلایەن کافرانەوە، ئێوەش بۆتان هەیە لە بەرانبەردا حورمەتی مانگی حەرام بشکێنن، وەك تۆڵەسەندنەوە، وە حورمەتەکان (واتە: ئەو شتانەی کە دەبێ ڕێزیان لێبگیرێ) تۆڵەیان تێدا هەیە ﴿ فَمَنِ اعْتَدَى عَلَيْكُمْ فَاعْتَدُوا عَلَيْهِ بِمِثْلِ مَا اعْتَدَى عَلَيْكُمْ ﴾، جا هەرکەسێك دەستدرێژیی کردە سەرتان، ئێوەش وەك دەستدرێژییەکەی خۆی دەستدرێژیی بکەنەوە سەر، بەڵام ﴿ وَاتَّقُوا اللَّهَ وَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ مَعَ الْمُتَّقِينَ ﴾، پارێز لە خوا بکەن، وە بزانن خوا لەگەڵ پارێزکاراندایە، واتە: پارێزکاربن‌و لەخواترس بن سنوور مەشکێنن، لە کاتێکدا دەتانەوێ بەرپەرچی دەستدرێژیی کافرەکان بدەنەوە، لە کۆتاییدا خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَأَنفِقُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ ﴾، جەنگ‌و جیهاد بە چی دەکرێ؟ دیارە پێش ئەوەی بە نەفس بکرێ، بە ماڵ دەکرێ، وە لەڕاستیدا کاتێ مسوڵمانان نەتوانن ماڵ‌و سامانی خۆیان ببەخشن، جەنگ‌و جیهادیان بۆ ناکرێ، بۆیە خوا ﷻ دەفەرموێ: لە ڕێی خوادا ماڵی خۆتان ببەخشن ﴿ وَلَا تُلْقُوا بِأَيْدِيكُمْ إِلَى التَّهْلُكَةِ ﴾، وە بەدەستی خۆتان خۆمەفەوتێنن، بەهۆی ماڵ نەبەخشینەوەو، بەهۆی جەنگ‌و جیهاد نەکردنەوەو سەرەنجام ملکەچکردن بۆ دوژمنان، چونکە زۆر کەس وا دەزانێ سەلامەتیی لە شەڕنەکردن‌و جەنگ نەکردن دایە، بەڵام بە پێچەوانەوە کەسێك ئامادە نەبێ بەرگریی لە دین‌و ژینی خۆی بکات، لە حورمەتەکانی خۆی

بکات، ئەوە مسۆگەر دەفەوتێ بەهۆی ملکەچیی و ژێردەستەیی یەوە، وە میللەتان زیاتر بەهۆی بەرگریی نەکردنەوە زەبوون دەبن، نەك بەهۆی بەرگرییکردنەوە بەرهەڵستیی کردنەوە ﴿ وَأَحۡسِنُوٓاْۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴾، وە چاکەکاربن، بێگومان خوا چاکەکارانی خۆشدەوێن، یانی: چاکەکاربن لە جەنگ کردنتاندا، وە چاکەکاربن لەگەڵ بەندەکانی خوادا، وە چاکەکاربن لە بەخشینی ماڵو سامانتان لە پێناوی بەرزکردنەوەی ئالای دینی خوای پەروەردگارو، لەپێناوی بەرگرییکردن لە دینو ژینی خۆتاندا.

## چەند مەسەلەیەکی گرنگ

**مەسەلەی یەکەم:** توێژەرەوانی قورئان لەوبارەوە، کە ئایا یەکەمین ئایەتێك کە هاتۆتە خوارو فەرمانی کردوە ئیمانداران لە پێناوی خودا بجەنگن، کامەیە؟ مشتومڕیان هەیە، هەندێکیان وەك (إبن كثير) لە (أبي جعفر الرازي) ئەویش لە (الرّبيع بن أنس) ئەویش لە (أبي العَالية)یەوە هێناویەتی[1]، دەڵێ: ئەم ئایەتەیە: ﴿ وَقَٰتِلُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ٱلَّذِينَ يُقَٰتِلُونَكُمۡ ﴾، لە ڕێی خودا بجەنگن لە دژی ئەو کەسانەی کە لەگەڵتان دەجەنگن، بەڵام (القُرطُبي)[2] لە ئەبو بەکری صیددیقەوە خوا لێی ڕازی بێ هێناویەتی، کە یەکەمین ئایەت کە فەرمانی کردوە، یاخود مۆڵەتی داوە بە ئیمانداران جەنگ بکەن، ئەم ئایەتەی سووڕەتی (الحج)ە، کە دەفەرموێ: ﴿ أُذِنَ لِلَّذِينَ يُقَٰتَلُونَ بِأَنَّهُمۡ ظُلِمُواْۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ نَصۡرِهِمۡ لَقَدِيرٌ ٣٩ ﴾، واتە: مۆڵەت درا بۆ ئەوانەی کە جەنگیان لەگەڵ دەکرێ {شەڕیان پێ دەفرۆشرێ} و ستەمیان لێکراوە، کە بەرگریی لەخۆیان بکەنو جەنگ بکەن، بەهەرحاڵ ئەگەر یەکەمین ئایەتی دابەزێنراو لەوبارەوە ئەوەی

١) بڕوانە: (المصباح المنير...)، ص: (١٣٨).

٢) (الجامع لأحكام القرآن)، ج: (٢)، ص: (٣١٢).

سووڕەتی (الحج) بێ، ئەوە دەگەیەنێ کە یەکەم جار جەنگ لەسەر مسوڵمانان فەرز نەکراوە، بەڵکو تەنها مۆڵەتیان پێدراوە، بەڵام ئەگەر ئەم ئایەتەی سووڕەتی (البقرة)بێ، ئەوە مانای وایە هەر یەکەمجار خوای کاربەجێ جەنگی فەرز کردوە.

**مەسەلەی دووەم:** لە ئیسلامدا یەك جۆرە جەنگمان هەیە، ئەویش بریتیە لە: جەنگ لە پێناوی خوادا (الجِهَادُ فِي سَبِيلِ الله، القِتَالُ فِي سَبِيلَ اللهَ)، واتە: لە ئیسلامدا دروست نیە بۆ ئەوە جەنگ بکرێ کە ماڵو سەروەتو سامان وەسەریەك بنرێ، هەروەك کاتی خۆی بووەو ئێستاش هەیە، زلهێزەکان کە وڵاتێکی دیکە داگیردەکەن، بۆ ئەوەیە نەوتەکەی بخەنە ژێر دەستی خۆیانو سامانی ژێرزەویو سەرزەوی بخەنە ژێر دەستی خۆیان، وە لە ئیسلامدا ڕەوانیە کە خەڵك زەلیل بکرێ، وەك ئێستا زلهێزان دەیکەن، وڵاتێك داگیردەکەن بۆ ئەوەی خەڵکەکەی بکەنە ژێر دەستی خۆیان، وە جەنگ نابێ لە پێناوی شکۆو مەجدی شەخصیی دابێ، یاخود لە پێناوی شکۆی نەتەوەیی یاخود طائیفەیی دابێ، تاکە جەنگێکی ڕەوا لە ئیسلامدا ئەوەیە کە بۆ بەرزکردنەوەی ناوی خوابێو بەپێی شەریعەتی خوابێ، کە دیارە ئەوەش وردەکارییو تەفصیلاتی زۆری هەیە، مەبەست ئەوەیە کە تەنها جەنگێك لە ئیسلامدا ڕەوابێ، جەنگێکە کە مۆری شەرعیی پێوە بێت، ئەگەرنا هەرکەسێك ڕاستبۆوە بۆی نیە لەخۆڕا بەناوی ئیسلامەوە جۆرە جەنگێك بەرپا بکاتو بڵێ: ئەوە لە پێناوی خوادایە، لەوبارەوە ئەو فەرمایشتە هەیە: {(عَنْ أَبِي مُوسَى الأَشْعَرِيّ ﷺ قَالَ: سُئِلَ النَّبِيُّ ﷺ عَنِ الرَّجُلِ يَقَاتِلُ شَجَاعَةً، وَيقَاتِلُ حَمِيَّةً، وَيُقَاتِلُ رِيَاءً، أيُّ ذَلِكَ فِي سَبِيلِ اللهِ؟ فَقَالَ: رَسولَ الله ﷺ: (مَنْ قَاتَلَ لِتَكُونَ كَلِمَةُ اللهِ هِيَ العُلْيَا فَهُوَ فِي سَبِيلِ الله) (مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ، البُخَارِيُّ برقم: (٢٨١٠)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٤٨٩٧)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٢٥١٧)}، واتە: ئەبو مووسای ئەشعەریی خوا لێی ڕازی بێ دەگێڕێتەوە، کە پرسیار لە پێغەمبەر ﷺ کرا: دەربارەی پیاوێك کە جەنگ دەکات تاکو بڵێن ئازایە، یەکێکی

دی جەنگ دەکات، وەك دەمارگیـریی {قـەومیی، یـان طـائیفی، یـان حیزبیی} یەکێکی دیکەش جەنگ دەکات تاکو باسی بکرێت‌و بۆ ڕیابازیی، کامیان لە ڕێی خوادایە؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: هەرکەسێك بجەنگێ بۆ ئەوەی ناوی خوا بەرزبێ، تەنها ئەوە لەڕێی خوادایەو {ئەویدیکە هیچی لە پێناوی خوادا نیە}.

**مەسەلەی سێیەم:** ئەم ڕستە قورئـانییەی، کە دەفـەرموێ: ﴿ وَقَـٰتِلُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ٱلَّذِينَ يُقَـٰتِلُونَكُمْ ﴾، بەلگەیە لەسەر ئەوە کە جەنگکردن لە ئیسلامدا ڕەوانیە لە دژی هیچ کافرێك کە ئیعلانی جەنگی لە دژی تۆ نەکردوە، یان شەڕی پێ نەفرۆشتووی‌و یاخەی پێ نەگرتووی، یان ڕێی لێ نەگرتووی، ئەوە مەسەلەیەکی گرنگە کە کافری لاشەڕ، یان بێلایەن، یاخود کەسێك نیشانەیەکی لێ دەرنەکەوتوە کە دوژمن بێ، ئەوە دروست نیە جەنگی لەگەڵدا بکرێ، چونکە خوای دادگەر دەفەرموێ: ﴿ وَقَـٰتِلُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ٱلَّذِينَ يُقَـٰتِلُونَكُمْ ﴾، وە لەڕێی خوادا بجەنگن لە دژی ئەوانەی کە شەڕتان لەگەڵ دەکەن، ئەدی کەسێك لاشەڕبێ ؟ دیارە دروست نیە، بۆیە دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تَعْتَدُوٓا۟ ﴾، وە دەستدرێژیی مەکەن، دەستدرێژییش ئەوەیە کەسێك شەڕت لەگەڵ نەکات، شەڕی پێ بفرۆشی، وەك لە سووڕەتی (النساء)دا خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِذَا ضَرَبْتُمْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ فَتَبَيَّنُوا۟ وَلَا تَقُولُوا۟ لِمَنْ أَلْقَىٰٓ إِلَيْكُمُ ٱلسَّلَـٰمَ لَسْتَ مُؤْمِنًا ﴿٩٤﴾ ﴾، واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە ! هەرکات ڕۆیشتن (بۆ بانگەواز، یاخود بۆ جەنگ‌و جیهاد، هەردووکی دەگرێتەوە) لەڕێی خوادا، وردببنەوە، وە کەسێك سڵاوی لێکردن، مەڵێن: تۆ بڕوادار نی، واتە: لەخۆڕا بیانوو بە خەڵك مەگرن‌و تەماع‌و لە ماڵ‌و سامانی مەکەن.

دیارە هەندێك لە زانایان دەڵێن: نەخێر هەرکەسێك کافر بوو دروستە بیکوژی‌و شەڕی لەگەڵدا بکەی، واتە: کاتێك کە ئەهلی کوفر شەڕ دەکەن لەگەڵ مسوڵمانانندا تۆش هەرکات بە یەکێکیان گەیشتی، با شەڕیشت لەگەڵ نەکات‌و

لاشـەڕیش بـێ، مـادام کـافرە، هـەر دروسـتـە شـەڕی لەگەڵـدا بکـەی، وە ئـەم ئایەتەی سووڕەتی (التوبة)ش بـە بەڵگـە دێننـەوە، کـە دەفـەرموێ: ﴿ وَقَـٰتِلُوا۟ ٱلْمُشْرِكِينَ كَآفَّةً كَمَا يُقَـٰتِلُونَكُمْ كَآفَّةً ﴿٣٦﴾ ﴾، بـەڵام ئـەم ڕسـتـە قورئانییـە ئـەوە ناگەیـەنێ، وەك (إبـن كـثیر) دەڵـێ[1]: ﴿ وَقَـٰتِلُوا۟ ٱلْمُشْرِكِينَ كَآفَّةً ﴾ {أي: جَمـيعكم}، واتـە: تێکڕاتـان لەگـەڵ موشریکەکاندا بجەنگن، کەواتە: مەبەستی ئایەتەکە ئەوەنیە کە لەگەڵ هەموو هاوبەش پەیداکەراندا بجەنگن، وەك چۆن هـەموویان لەگـەڵتان دەجـەنگن، نـەء بەڵکو ئایەتەکە دەفەرموێ: هـەمووتان لەگـەڵ هاوبـەش پەرسـتەکاندا بجـەنگن، وەك چۆن ئەوان هـەموویان لەگـەڵتان دەجـەنگن، واتـە: مـسوڵمانینە ! هیـچتان دوامەکـەون لـە جـەنگـو جیهـاد دژی کافرەکـان، بـە هـەمووتانو بـە تێکڕایـی لەگەڵیانـدا جـەنگ بکـەن، وەك چـۆن ئـەوان بـە تێکڕایـی لەگـەڵتان دەجـەنگن، ئەگەرنا ئێمە چەندان بەڵگـەمان هەیـە لەسـەر ئـەوە، کـە کەسێك بـا کـافریش بـێ، عـەینی کوفرەکـەی پاسـاو نیـە بـۆ ئـەوەی کـە تـۆ شـەڕی لەگـەڵ بکـەیو، عەینـی کوفرەکـەی خوێنی ئەو بۆ تۆ حـەڵاڵ ناکاتو دەتوانین چـەندان بەڵگـە بێنینـەوە لەوبـارەوە :

١- بـە دەقـی قورئـان خـاوەن کتێبـەکان سـەرانەیان لـێ وەردەگیـرێ، واتـە: ئـەو خاوەن کتێبانەی کە شەڕ لەگـەڵ مسوڵماناندا دەکـەن، کاتێـك کـە تێکدەشکێن، مـادام ئامـادە بـن شـەڕ ڕابگـرن، سـەرانەیان لێوەردەگیـرێ، وەك خـوا ﷻ لـە سووڕەتی (التوبة)دا دەفـەرموێ: ﴿ قَـٰتِلُوا۟ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَلَا بِٱلْيَوْمِ ٱلْـَٔاخِرِ وَلَا يُحَرِّمُونَ مَا حَرَّمَ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ وَلَا يَدِينُونَ دِينَ ٱلْحَقِّ مِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَـٰبَ حَتَّىٰ يُعْطُوا۟ ٱلْجِزْيَةَ عَن يَدٍ وَهُمْ صَـٰغِرُونَ ﴿٢٩﴾ ﴾، واتـە: لەگـەڵ ئەوانەدا بجـەنگن کە کـتێبیـان پێدراوە، کەچی بڕوا بـە خـواو بـە ڕۆژی دوایـی

---

١) (المصباح المنير في تهذيب تفسير إبن كثير)، ص: (٥٦٧) .

ناهێنن‌و، ئەوەی خواو پێغەمبەرەکەی قەدەغەیان کردوە، قەدەغەی ناکەن‌و، مل بۆ ئایینی هەق نادەن، هەتا سەرانە دەدەن‌و، ملکەچ دەبن، (واتە: ملکەچ دەبن بۆ دەسەڵاتی ئیسلامیی‌و واز لە شەڕ پێفرۆشتن دێنن)، کەواتە: ئیسلام لێ دەگەڕێ خاوەن کتێبەکان لەسەر دینی خۆیان بمێننەوەو هەر کافریش بن، بە مەرجێك دژی دەوڵەتی ئیسلامیی نەبن.

٢- پاشان لە سووڕەتی (النساء)دا ئایەتێکی ڕوون‌و ڕاشکاومان هەیە، کە خوای پەروەردگار لە مسوڵمانان قەدەغە دەکات کە شەڕ لەگەڵ ئەو کافرانەدا بکەن کە بێ لایەنن، وەك فەرموویەتی: ﴿ إِلَّا ٱلَّذِينَ يَصِلُونَ إِلَىٰ قَوْمٍۭ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُم مِّيثَٰقٌ أَوْ جَآءُوكُمْ حَصِرَتْ صُدُورُهُمْ أَن يُقَٰتِلُوكُمْ أَوْ يُقَٰتِلُوا۟ قَوْمَهُمْ ۚ وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ لَسَلَّطَهُمْ عَلَيْكُمْ فَلَقَٰتَلُوكُمْ ۚ فَإِنِ ٱعْتَزَلُوكُمْ فَلَمْ يُقَٰتِلُوكُمْ وَأَلْقَوْا۟ إِلَيْكُمُ ٱلسَّلَمَ فَمَا جَعَلَ ٱللَّهُ لَكُمْ عَلَيْهِمْ سَبِيلًا ﴿٩٠﴾ ﴾النساء، ئایەتەکانی پێش ئەم ئایەتە دەفەرموون: شەڕ لەگەڵ ئەو کافرانەدا بکەن کە لە دژتان دەجەنگن دوایی دەفەرموێ: ﴿ إِلَّا ٱلَّذِينَ يَصِلُونَ إِلَىٰ قَوْمٍۭ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُم مِّيثَٰقٌ ﴾، جگە لەوانەی کە پەیوەندییان هەیە لەگەڵ کۆمەڵێك لە کافرەکاندا کە ئەو کۆمەڵە کافرە لەگەڵ ئێوەدا هاوپەیمانن (واتە: نەك دروست نیە لەگەڵ هاوپەیمانەکاندا کە کافرن بجەنگی، بەڵکو لەگەڵ ئەوانەی کە پەیوەندی بەوانیشەوە هەیە دروست نیە تۆ دەستپێشخەری شەڕو جەنگ بی) یاخود کەسانێك دێن بۆلاتان، سەغڵەتن لەوەی کە شەڕ لەگەڵ ئێوەدا بکەن، یاخود شەڕ لەگەڵ قەومەکەی خۆیاندا بکەن، (واتە: ئەوانەی کە بێ لایەنن، ئێوە بۆتان نیە شەریان لەگەڵ بکەن) وە ئەگەر خوا ویستبای ئەوانی بەسەر ئێوەدا زاڵ دەکردو لەگەڵتاندا دەجەنگان، جا ئەگەر کەناریان گرت‌و جەنگیان لەگەڵ نەکردن‌و دەستی خۆیان لە ئێوە پاراست و ئاشتییان لەگەڵتان کرد، ئەوە خوا هیچ ڕێگایەکی بە ئێوە نەداوە کە لەگەڵیاندا بجەنگن.

٣- بەڵگەیەکی دیکە لەسەر ئەوەی کە کافرەکان لەسەر کوفر ناکوژرێن، بەڵکو لەسەر ئەوە دەکوژرێن کە دەستدرێژیی بکەنە سەر مسوڵمانانو شەڕ لەگەڵ مسوڵماناندا بکەن، ئەوەیە کە بەدەقی فەرمایشتی پێغەمبەر ﷺ نابێت ئافرەتو منداڵ پیرو نەخۆشو کرێکارو جوتیارو ڕاهیبو بکوژرێن، وەك لە چەند حەدیسێکدا هاتوە، کە دوایی باسیان دەکەین.

**مەسەلەی چوارەم:** هۆکاری جەنگکردن لەگەڵ کافراندا، وەك زۆربەی هەرە زۆری زانایانو شەرعزانان دەڵێن: بریتی نیە لە کوفرەکەیان، بەڵکو بریتیە لە دەستدرێژییەکەیان، واتە: بۆیە جەنگ لەگەڵ کافراندا دەکرێ کە دەستدرێژیی دەکەنە سەر مسوڵمانانو شەڕیان لە دژ دەکەن، نەك لەبەر ئەوەی کە کافرن، چونکە ئەگەر لەبەر کوفرەکەیان بووایە دەبوو جوولەکەو نەصرانییو سەرجەم کافرانی دیکەی هاوولاتیی ئیسلام پێی گوتبان: ئەگەر مسوڵمان نەبن هەر دەتانکوژینو سەرانەتان لێوەرناگیرێ، وە دەبوو ژنو منداڵیش هەر بکوژرێن، چونکە ژنو منداڵەکەش هەر هی ئەوانن، وە دەبوو پیرو نەخۆشو ڕاهیبو کرێکارو جووتیاریش هەر بکوژرێن، کە دەقی حەدیسی پێغەمبەری ﷺ لەسەرە ئەوانە هیچ کامیان ناکوژرێن، ئنجا لەڕاستیدا کاتێك خەڵکی کافر سەرپشك دەکرێ لە نێوانی کوژرانو ئیمان هێناندا، ئەوە دژی ئایەتی خوایە، چونکە خوای دادگەر دەفەرموێ: ﴿ لَآ إِكْرَاهَ فِى ٱلدِّينِ ...(٢٥٦) ﴾ البقرة، تۆبزیی کردنو ناچارکردنی خەڵك لە دیندا نیە، وە پاشانیش کەسێك کە بە تۆبزییو لە ترسان بێتە نێو ئیسلامەوە، ئەوە نابێتە مسوڵمان، بەڵکو دەبێتە مونافیق کە لە کافر خراپترە.

**مەسەلەی پێنجەم:** ئەم ڕستەیەی، کە دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تَعْتَدُوٓا۟ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْمُعْتَدِينَ ﴾، وە دەستدرێژیی مەکەن خوا دەستدرێژکەرانی خۆشناوێن، هەم ئەوە دەگەیەنێ کە کافری لاشەڕو بێلایەن دروست نیە جەنگیان لەگەڵ بکرێ، وە هەم ئەوەش دەگەیەنێ کە مسوڵمانان لە گەرمەی جەنگو جیهادیشدابن، دەبێ ئاگایان لێ بێ سنوورەکانی شەرع نەبەزێنن،

وە ئەدەبەکانی شەرع پێشێل نەکەن ئەمەش چەند فەرموودەیەك بۆ ئیسپاتی ئەوەی باسمان کرد:

**فەرموودەی یەکەم:** {(أخرَجَ ابن جَرير و ابن المُنذِر وابن أَبي حَاتم عَن ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمْا في قوله تعالى: ﴿وَلَا تَعْتَدُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْمُعْتَدِينَ﴾، يَقُولُ: وَلاتَقتُلُوا النِسَاءَ والصِّبيَانَ والشَيخ الكَبير وَلا مَن ألقى السَلَامَ وَ مَن كَفَّ يَدَهُ، فَإِنْ فَعَلتُمُ فَقَد اعتَدَيتُمْ)}، واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس خوا لە خۆیو بابی ڕازی بێ، لە تەفسیری ئەم ڕستە قورئانییەدا، کە دەفەرموێ: ﴿وَلَا تَعْتَدُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْمُعْتَدِينَ﴾، دەڵێ، واتە: ئافرەتانو منداڵانو پیاوی بە تەمەن مەکوژن، وە کەسێك کە شەڕتان لەگەڵ ناکاتو ئەوەی کە دەستتان لێ دەپارێزێ مەکوژن، ئەگەر ئەوانە بکوژن، ئەوە دەستدرێژییتان کردووەو پێچەوانەی فەرمانی خوا جووڵاونەتەوە.

**فەرموودەی دووەم:** {(عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بن عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمْا، أَنَّ امْرَأَةً وُجِدَتْ فِي بَعْضِ مَغَازِي رَسولِ اللَّهِ ﷺ مَقْتُولَةً، فَأَنْكَرَ رَسولُ اللَّهِ ﷺ قَتْلَ النِّسَاءِ وَالصِّبْيَانِ) (مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ، والبُخَارِيُّ برقم: (٣٠١٤)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٤٥٢٢))}، واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر خوا لە خۆیو بابی ڕازیبێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە هەندێك لە جەنگەکانیدا ئافرەتێکی کوژراوی بینی پێی ناخۆشبوو، وە پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کرد کە ئافرەتو منداڵان بکوژن.

**فەرموودەی سێیەم:** {(اغْزُوا بِاسْمِ اللَّهِ، فِي سَبِيلِ اللَّهِ، قَاتِلُوا مَنْ كَفَرَ بِاللَّهِ، اغْزُوا، وَلاَ تَغُلُّوا، وَلاَ تَغْدِرُوا، وَلاَ تَمْثُلُوا، وَلاَ تَقْتُلُوا وَلِيدًا، وَلاَ أَصْحَاب الصَّوَامِعِ) (رَوَاهُ مُسْلِمٌ برقم: (٤٤٩٧)، عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ بُرَيْدَةَ عَنْ أَبِيهِ رضي الله عنه)}، واتە: بەناوی خواو لەڕێی خوادا بجەنگن، دژی ئەو کەسانە بجەنگن کە کوفر بەخوا دەکەن (وە دژایەتییشتان دەکەن، وەك لە ئایەتو فەرموودەکانی

دیکەدا ئەوە ڕوون کراوتەوە) وە دزیی لە غەنیمەت مەکەن‌و، پەیمانشکێنیی مەکەن، وە جەنازەی مردووەکان مەشێوێنن (بەوەی کە گوێی ببڕی‌و لووتی ببڕی، وەك کاتی خۆی عادەت بووە)، وە منداڵ مەکوژن، وە ئەوانەی کە لە صەومیعەکاندان {واتە: لە شوێنی پەرستگای خۆیاندان‌و خواپەرستیی دەکەن} مەکوژن.

چوارەم: ئنجا لە وەسیەتی ئەبو بەکر یەکەم جێنشینی پێغەمبەر ﷺ دا خوا لێی ڕازی بێ هاتوە، کە سوپایەکانی بەڕێ دەکردن، بەمجۆرە وەصیەتی دەکردن:

{(وإنّي مُوصيك بعشر: لا تَقتُلَنَّ امرأةً، ولا صَبِيّاً، ولا كبيراً هَرماً، ولا تقطعنَّ شجراً مُثْمِراً، ولا تخرِّبَنَّ عامِراً، ولا تَعْقِرَنَّ شاةً، ولا بعيراً الاّ لِمأْكلةٍ، ولا تحرِّمَنَّ نَخْلاً ولا تُفَرقنَّهُ، ولا تَغْلُلْ، ولا تَجْبُنْ}[(١)].

واتە: وە من بە دە (١٠) شت ئامۆژگارییت دەکەم:

١- هیچ ئافرەتێك مەکوژە .

٢- وە هیچ منداڵێك مەکوژە .

٣- وە پیاوی پیری بەتەمەن مەکوژە.

٤- وە درەختی بەردار مەبڕە.

٥- وە هیچ ماڵێك تێك مەدە (خانوو وێران مەکە).

٦ و٧- وە مەگەر بۆ خواردن، ئەگەر مەڕو حوشتر سەرمەبڕە.

٨- وە دارخورما مەسووتێنەو بەرەکەی لێ مەوەرێنە.

٩- وە دزیی لە دەستکەوت (غنیمة) مەکەو هیچی لێ پەنهان مەکە.

١٠- وە مەترسە ( لە دوژمن) .

---

١) بڕوانە: موطأ مالك، (٢/٦)، وە (آثار الحرب، دراسة فقهية مُقارنة)، د، وهبة الزحيلي، ص: (٤٦٨).

**مەسەلەی شەشەم:** ئەم ڕستە قورئانییەی، کە دەفەرموێ: ﴿ وَٱقْتُلُوهُمْ حَيْثُ ثَقِفْتُمُوهُمْ ﴾، واتە: لە هەر شوێنێك بەر پەلتان کەوتن بیانکوژن، بە زاراوی کوردەواریی خۆمان: بە بست جەبیان مەدەن، وەك لە فەرموودەی پێغەمبەردا هاتوە ﷺ {(قَالَ لِخَالِد وَمَنْ مَعَهُ يَوْمَ الفَتْح: إنْ عَرَضَ لَكُمْ أحَدٌ مِن قُرَيش فَاحْصُدُوهُم حَصْداً حَتَّى تُوافُوني عَلَى الصَفا) (رَوَاهُ ابن حبَّان برقم: (٤٧٦٠)، وَقَالَ شعيب الأرنؤوط: إسنادُهُ صَحِيح عَلَى شَرْطِ مُسلم}، واتە: پێغەمبەر ﷺ بە خالیدو ئەوانەی کە لەگەڵی بوون لە ئازادکردنی مەککەدا فەرمووی: ئەگەر هەرکام لە موشریکەکان هاتنە پێشتان بیانلروون، تاکو لەسەر کێوی صەفا پێم دەگەنەوە.

دیارە ئیسلام چەندە لەگەڵ خەڵکی لاشەڕدا بە بەزەیی یە، بە پێچەوانەشەوە لە کاتی شەڕدا، هێندە لەگەڵ دوژمن زبرو بێڕەحمە، چونکە بەبێ جورئەت و غیرەت و زبریی، جەنگت بۆ ناکرێ و دیفاعت پێ لە خۆت ناکرێ و گوتراویشە: هیچ کەس لە شەڕێدا شەکر نابەشێتەوە.

**مەسەلەی حەوتەم:** ئەم ڕستە قورئانییەی، کە دەفەرموێ: ﴿ وَأَخْرِجُوهُم مِّنْ حَيْثُ أَخْرَجُوكُمْ ﴾، مەبەست پێی ئەوەیە وەك خۆیان سزایان بدەنەوە، ئەگەرنا خۆ تۆ هەموو ڕۆژێ لە مەککەدا شەڕ ناکەی ! بەڵام مەبەست ئەوەیە وەك چۆن ئێوەیان لە ماڵ وحاڵی خۆتان لە شاری مەککە وەدەرناوە، ئێوەش لەوێ وەدەریان بنێن، یان ئەگەر لە مزگەوتی حەرامدا، شەڕیان لەگەڵ کردن، ئێوەش لەوێدا شەڕیان لەگەڵدا بکەن، واتە: هەر کافرێك هەر دوژمنێك تۆی چۆن سزادا، تۆش بۆت هەیە بەو شێوەیە سزای بدەیتەوە، بەڵام بە مەرجێك ئەو سزایە پێچەوانەی دەقێکی شەرعیی نەبێت، بۆ وێنە: ئەگەر ئەوان هاتن داوێن پیسییان کرد لەگەڵ ئافرەتێکی مسوڵماندا تۆ بۆت نیە بڵێی: منیش داوێن پیسیی دەکەمەوە لەگەڵ ئافرەتی ئەواندا، یان ئەگەر کافر مسوڵمانی سووتاند تۆش بڵێی منیش ئەو دەسووتێنم، لەسەر ڕای ئەو زانایانەی کە دەڵێن:

سووتاندن دروست نیە.

هەنـدێکی دیکـە دەڵـێن: بـەپێی ئـەم ئایەتـەی، کـە دەفـەرموێ: چـۆن دەسـتدرێژییان کـرد، ئـاوا دەسـتدرێژیی بکەنـەوە، بەرپەرچدانەوەی هاووێنـە دروستە، بەڵام بێگومان ئەم ڕستە قورئانییە کە دەفەرموێ: وەك خۆیان سزایان بدەنەوە، ئەو شتانەی لێ هەڵداوێردرێن‌و لێی جیادەکرێنەوە، کـە بـە دەقێکی شەرعیی جیاکراونەتەوە، کە دروست نیە لەگەڵ کافراندا بەکاربهێنرێن.

**مەسەلەی هەشتەم:** دەربـارەی وشـەی (فِتْنَةٌ) کـە دەفەرموێ: ﴿ وَقَٰتِلُوهُمۡ حَتَّىٰ لَا تَكُونَ فِتۡنَةٞ ﴾، لەگەڵیاندا بجەنگن هەتا (فِتنَة) نامێنێ، لەمانا زمانەوانییەکەیدا ڕوونمان کردەوە، کە (فِتنَة) کە لە ئەسڵدا بە مانـای قاڵـکردنەوەی زێـڕ دێ، کـە لەسـەر ئـاگر بـسووتێ‌و قـاڵی بکەیـەوە، تـاکو دەربکـەوێ زێـڕی سـاغە یـان نـا؟ ئەسڵەکەی ئەوەیە، دوایی ئەو مانایە خـوازراوەتەوە بۆ هەر ئەشکەنجەدان‌و هەر تاقیکردنەوەیەك، وە لێرەدا بە مانای ئازاردانی مـسوڵمانان‌و هەڵـگێڕانەوەیـانە، یـاخود ڕێ لێگرتنیانـە لـەوەی مـسوڵمان بـن‌و ئیمـان بێـنن، وە ئەوانـەی کـە گوتوویانە: وشەی (فِتْنَةٌ) لێرەدا بە مانای (شیـرك‌و کوفر) دێ، ئـەوە تەماشـای سـەرەنجامی ئازاردانەکەیان کردەوە، واتە: کە کەسێك ئازار بدرێ لەسەر ئەوە کە ئیمان بێنێ‌و، سـەرەنجام لەسـەر کوفر بمێنێتەوە، یان مـسوڵمانێك ئازار بدرێ بۆ ئەوەی کە کافر بکرێ، ئەگەرنا لە ئەسڵدا وشەی (فِتْنَةٌ) بە مانـای (شـرك‌و کفـر) نایـەت‌و بـەمانای ئـازارو ئەشـکەنجەدان دێـت، وە وشـەی (فِتْنَةٌ) لـە قورئانـدا بـە چەند مانایـەك بەکارهاتوە:

**یەکەم:** بەمانای تاقیکـردنەوە دێ، وەك لـە سـوورەتی (العنکـبوت)دا دەفەرمـوێ: ﴿ الٓمٓ ۝١ أَحَسِبَ ٱلنَّاسُ أَن يُتۡرَكُوٓاْ أَن يَقُولُوٓاْ ءَامَنَّا وَهُمۡ لَا يُفۡتَنُونَ ۝٢ ﴾، واتـە: ئەلیـف، لام، میم، ئایا خـەڵك پێیـان وایـە بەوەنـدە وازیـان لـێ دەهێنـرێ کـە بڵێـن: بڕوامان هێنـا، بێ‌ئەوەی تاقیبکرێنەوە !!.

**دووەم**: بەمانای فریودان‌و هەڵخەڵەتاندن دێ، وەك لە سوورەتی (الأعراف)دا خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ لَا يَفۡتِنَنَّكُمُ ٱلشَّيۡطَٰنُ كَمَآ أَخۡرَجَ أَبَوَيۡكُم مِّنَ ٱلۡجَنَّةِ ...﴿٢٧﴾ ﴾، واتە: ئەی وەچەی ئادەم ! شەیتان هەڵتان نەخەڵەتێنێ‌و فریوتان نەدات، وەك چۆن باب‌و دایكتان (ئادەم‌و حەووا)ی هەڵخەڵەتاندو لە بەهەشتی وەدەرنان.

**سێیەم**: بەمانای بەڵاوگرفتاریی، دێ، هەر بەڵاو گرفتارییەك بەسەر ئینسان بێ، پێی دەگوترێ: (فِتنة)، وەك خوا ﷻ لە سوورەتی (الأنفال)دا دەفەرموێ: ﴿ وَٱتَّقُواْ فِتۡنَةٗ لَّا تُصِيبَنَّ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ مِنكُمۡ خَآصَّةٗۖ وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلۡعِقَابِ ﴿٢٥﴾ ﴾، واتە: لە بەڵایەك بترسن كە تەنیا تووشی ستەمكارەكان نابێ، وە بزانن كە خوا سزای توندە.

**چوارەم**: بەمانای گومڕاكردن، دێ، وەك لە سوورەتی (المائدة)دا دەفەرموێ: ﴿ وَمَن يُرِدِ ٱللَّهُ فِتۡنَتَهُۥ فَلَن تَمۡلِكَ لَهُۥ مِنَ ٱللَّهِ شَيۡـًٔاۚ ﴿٤١﴾ ﴾، واتە: هەركەسێك خوا بیەوێ گومڕای بكات، تۆ هیچ شتێكت بۆ وی لە بەرانبەر خوادا پێناكرێ.

**پێنجەم**: وە بەمانای ئازاردان، دێ، وەك لە سوورەتی (البقرة)دا دەفەرموێ: ﴿ وَقَٰتِلُوهُمۡ حَتَّىٰ لَا تَكُونَ فِتۡنَةٞ وَيَكُونَ ٱلدِّينُ لِلَّهِ ﴾، واتە: وە لەگەڵ كافراندا بجەنگن، هەتا (فِتنة) نامێنێ، واتە: تاكو كافرەكان توانای ئەوەیان نامێنێ مسوڵمانان ئازار بدەن‌و ئەشكەنجەیان بدەن، وە لەدین هەڵیانبگێڕنەوە، یاخود خەڵكی ئازار بدەن‌و نەهێڵن مسوڵمان ببن، جا لێرەدا ئەمە ئەوەی لێ وەردەگیرێ، كە ئەو وشە قورئانییانەی دێنە پێشمان، دەبێ تەماشای سیاقەكەیان بكەین، ئەگەرنا جاری وایە یەك وشەی قورئانی بە پێنج مانا دێ، بۆیە دەبێ تەماشای بكەین كە لە چ سیاقێكدا هاتووە، تەماشای وشەكانی پێشەوەو دواوەی بكەین، ئنجا مانایەكەی زیاتر دێتە دەست‌و ڕوون

دەبێتەوە، کەواتە: ئەو ڕستە قورئانییەی کە دەفەرموێ: ﴿وَٱلْفِتْنَةُ أَشَدُّ مِنَ ٱلْقَتْلِ﴾ (فِتنة) لە کوشتن سەختترە، سەرەنجام ئەم دوو واتایەی هەن:

یەك: ئازاردانی کافران بۆ مسوڵمانان لە کوشتنی مسوڵمانان خراپترە، واتە: ئەگەر ئازاریاندان، تاکو ڕێیان لێ بگرن، کە دینداریی بکەن، ئەوە خراپترە لەوەی کە بیانکوژن، چونکە ئەگەر بیانکوژن، هەرچەندە جەستەیان دەفەوتێ بەس ڕووحیان سەلامەت دەبێ، بەڵام کە کافریان بکەنەوە، مانای وایە بەجەستەو بە ڕووحەوە فەوتاون.

دوو: وە مانایەکی دیکەی ئەوەیە، کە کافربوونەوەی مسوڵمان، یان مانەوەی ئینسان لەسەر کوفر، لە کوژرانی خراپترە.

**مەسەلەی نۆیەم:** ﴿وَلَا تُقَٰتِلُوهُمْ عِندَ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ حَتَّىٰ يُقَٰتِلُوكُمْ فِيهِ﴾، واتە: وە لە لای مزگەوتی حەرام جەنگ لەگەڵ کافراندا مەکەن، مەگەر ئەوان دەستپێشخەریی بکەنو جەنگتان لەگەڵ بکەن، ئەمە ئەوە دەگەیێنێ کە مسوڵمانان شەریعەت دەستیان ئاوەڵا دەکاتەوە لەکاتی بەرگرییکردنیاندا لە خۆیانو، کاتێك مسوڵمانان دەگەنە حاڵەتی بەرهەڵستییو بەرگریی، دەستیان ئاوەڵایە کە شێوازی جۆراو جۆر بەکاربێنن بۆ بەرگریی لەخۆکردنیان، بەڵام گرنگ ئەوەیە دەستپێشخەر نەبن، ئەگەرنا کاتێك مسوڵمان شەڕی پێ دەفرۆشرێو یەخەی پێدەگیرێ، شەرع زیاتر دەستی ئاوەڵا دەکاتەوە، وەك لە حاڵەتی ئاسایی، مەبەستم ئەوەیە ئایا مسوڵمان بۆی هەیە لە حاڵەتی ئاساییدا بچێ خەڵك لەنێو مزگەوتی حەرامدا بکوژێ؟ بێگومان نەخێر، بەڵام ئەگەر کافران لەوێدا شەڕیان پێ فرۆشتن، ئەوە بۆیان هەیە لەوێشدا بیانکوژن، بۆچی؟ چونکە ناچارکراون، جا بۆیە شەرعزانان دەڵێن: (لِلضَرُوراتِ أَحكَامُهَا)، واتە: کاتەکانی ناچاریی یاساکانی تایبەتی خۆیان هەیە.

**مەسەلەی دەیەم:** ئەم ڕستە قورئانییەی، کە دەفەرموێ: ﴿ فَإِنِ ٱنتَهَوۡاْ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴾، جا ئەگەر دەستیان هەڵگرت و وازیان هێنا، بێگومان خوا لێبوردەی بە بەزەیی یە، دەگونجێ مەبەست پێی دەستهەڵگرتنی کافرەکان بێت لە کوفر، یاخود دەستهەلگرتنیان بێت لە زوڵم، جا ئەگەر مەبەست دەستهەلگرتنیان بێت لە کوفر، ئەوە کە دەفەرموێ: ﴿ فَإِنِ ٱنتَهَوۡاْ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴾، واتە: بەدڵنیایی خوا لێیان دەبوورێ، چونکە وازیان لە کوفر هێناوە، ئەدی ئەگەر مەبەست پێی دەستهەڵگرتنیان بێ لە زوڵم، کە سیاقی ئایەتەکان زیاتر ئەوە دەگەیەنێ، واتە: خوا ﷻ لێبوردەو بە بەزەیی یەو ئێوەش ئەی ئیمانداریینە ! چاو لە پەروەردگاری خۆتان بکەن و چاوپۆشییتان هەبێ و بەزەییتان هەبێت لە بەرانبەر کافرێکدا، کە شەڕ ناکات لە دژتان، ئەگەرنا خوا لە هیچ کافرێك خۆش نابێ هەتا کافر بێت، بەڵام هەر کافرێك زوڵمی نەکرد، ئەی مسوڵمانینە ! وەك چۆن خوا ﷻ خاوەن دوو سیفەتی لێبوردەیی و بەزەیی یە، ئێوەش لەگەڵ کافراندا لێبوردنتان هەبێ و بەزەییتان هەبێ، مادام ئەوان شەڕتان پێ نەفرۆشن و دەستدرێژیی نەکەنە سەرتان، ئێوەش دەستپێشخەریی جەنگ و دەستدرێژیی مەبن.

**مەسەلەی یازدەیەم:** ئەوە، کە خوا دەفەرموێ: ﴿ وَقَٰتِلُوهُمۡ حَتَّىٰ لَا تَكُونَ فِتۡنَةٞ وَيَكُونَ ٱلدِّينُ لِلَّهِ ﴾، ئەوە دەگەیەنێ، کە ئامانجی جەنگ و جیهاد بریتیە لە نەهێشتنی ئاشووب و ئازاردانی مسوڵمانان لەلایەن کافرانەوە، نەك لابردنی کوفرو شیرك، چونکە خوا ﷻ نەیفەرموە: (وَقَاتِلُوهُم حَتى لا يَبقى كُفرٌ وَشِركٌ) بەڵکو فەرموویەتی: ﴿ وَقَٰتِلُوهُمۡ حَتَّىٰ لَا تَكُونَ فِتۡنَةٞ وَيَكُونَ ٱلدِّينُ لِلَّهِ ﴾، جا هەندێك لە زانایان ئەو ﴿ وَيَكُونَ ٱلدِّينُ لِلَّهِ ﴾یان بە هەڵە لێکداوەتەوە، وەك دوایی باسی دەکەم، وایانزانیوە وشەی (دین) بە مانای ئیسلام دێ، کە ئەوکاتە

مانایەکەی ئاوا دەبێ: {هەتاکو ئایین (ئیسلام) تەنیا هی خوا دەبێ}، بەڵام بێگومان ئەو مانایە هەڵەیە، چونکە جەنگ و جیهاد بکرێ، یان نا (ئیسلام) هەر هی خوایەو بەشی کەسی دیکەی پێوەنیە، بەڵکو لێرەدا مەبەست لە (دین)، (ملکەچیی)یە، واتە: تا وای لێدێ خەڵك بێجگە لە خوا ملکەچی هیچ کەسی دیکە نابن، ئەوکاتە بە ئارەزووی خۆیان ئیمان دێنن، یان کافر دەبن، ئازادن، چونکە ئەگەر شەریعەتی خوا ﷻ حاکم بێت مەجال بە خەڵکی دەدات بڕوا بێنن یان نا، وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ فَمَن شَآءَ فَلْيُؤْمِن وَمَن شَآءَ فَلْيَكْفُرْ ﴿٢٩﴾ ﴾ الكهف، بەڵام لە کاتێکدا ڕێچکە شەیتانییەکان حاکم دەبن، ئازادیی خەڵك زەوت دەکەن و دەڵێن: یان دەبێت بێنە سەر دینی ئێمە یان نابێ هەبن! کەچی ئیسلام دەڵێ: ﴿ لَكُمْ دِينُكُمْ وَلِيَ دِينِ ﴿٦﴾ ﴾ الكافرون، دینی خۆتان بۆ خۆتان دینی خۆم بۆ خۆم، بەڵام ئەهلی کوفر کاتێك دەسەڵاتیان هەبێ، بەزۆر شتی خۆیان بەسەر خەڵکدا دەسەپێنن. کەواتە: ئامانجی جەنگ و جیهاد لە ئیسلامدا ئەوەیە کە ئازاردان و ئەشکەنجەدان نەمێنێ و ئازادیی زەوت نەکرێ، نەك کوفرو شیرك لەبەین بچێ، چونکە خوا بۆخۆی ڕێگای داوە کە خەڵك کافربێ، دیارە وەك شەریعەت لەسەری پێویست کردوون کە ئیمان بێنن، بەڵام شەریعەتەکەی ڕێگای داون بە ئازادیی ئیمان بێنن، یان ئیمان نەهێنن ﴿ فَمَن شَآءَ فَلْيُؤْمِن وَمَن شَآءَ فَلْيَكْفُرْ ﴿٢٩﴾ ﴾ الكهف، کەواتە: ئێمە کە بەندەی خواین و دەمانەوێ شەریعەتی خوا جێبەجێ بکەین، بۆمان نیە مافێك کە خوا بە بەندەکانی داوە، لێیان بستێنینەوە، لێیان زەوت بکەین، هەڵبەتە هەر بۆیەش لە ڕۆژگاری پێغەمبەری خوا ﷺ لە شاری مەدینەدا، هەرکام لە سێ تیرەکانی (بَنو النضير و بَنو قينقاعُ و بَنو قُريظة) هەبوون، هەروەها ژمارەیەك نەصرانیی و هاوبەش دانەرانیش هەبوون، هەتاکو دوایی ئازادانە مسوڵمان بوون، یان بە ڕواڵەت خۆیان بە مسوڵمان پێشاندا، جوولەکەو نەصرانییەکانیش هەتا لە مەدینەدا بوون ئازاد بوون و

سەرانەشیان نەدەدا![1].

**مەسەلەی دوازدەیەم:** یەكی دیكە لەو مەسەلە گرنگانە كە لەم ڕستە قورئانییە وەردەگیرێن، ئەوەیە كە خوا ﷻ كە دەفەرموێ: ﴿وَقَٰتِلُوهُمۡ حَتَّىٰ لَا تَكُونَ فِتۡنَةٞ وَيَكُونَ ٱلدِّينُ لِلَّهِ﴾، واتە: لەگەڵیاندا بجەنگن تاكو (فِتنَة) نامێنێ، وە ملكەچیی هەمووی بۆ خوا دەبێ، واتە: مەبەست لە وشەی (دین) لەم ڕستە قورئانییەدا ملكەچیی یە نەك ئیسلامەتیی، وە وەك پێشتر گوتمان: هەندێ كەس بە هەڵە ئەم ڕستە قورئانییەیان تەفسیركردووە، گوتوویانە: دەبێ جەنگ و جیهاد لەگەڵ ئەهلی كوفردا بكرێ، هەتا تەنیا ئیسلام حاكم دەبێ، بە واتایەكی دی جەنگ لەگەڵ كافراندا دەكرێ تاكو مسوڵمان دەبن، وەك لە سووڕەتی (الفتح)دا هاتوە، دەفەرموێ: ﴿تُقَٰتِلُونَهُمۡ أَوۡ يُسۡلِمُونَ ... ١٦﴾، {لەگەڵیاندا دەجەنگن، یان مسوڵمان دەبن} لێكیان داوەتەوە، بەڵام لە ڕاستیدا وانیەو (يُسۡلِمُونَ)، واتە: ملكەچ دەكەن (يَخضَعونَ)، واتە: لەگەڵیاندا دەجەنگن، یان دەبێ ملكەچ بكەن، كەواتە: وشەی: (يُسۡلِمُونَ) بە مانای هاتنە نێو ئیسلام نیە، بەڵكو بە مانای ملكەچ كردنە، وە لێرەشدا خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿وَقَٰتِلُوهُمۡ حَتَّىٰ لَا تَكُونَ فِتۡنَةٞ وَيَكُونَ ٱلدِّينُ لِلَّهِ﴾، (دین) لێرەدا ناگونجێ بەمانای ئیسلام بێ، بۆچی؟ چونكە مسوڵمانان لە ڕێی خودا جەنگ و جیهاد بكەن یان نا، ئیسلام وەك دین، بەشی غەیری خوای پەروەردگاری هەر پێوە نیە، واتە: ئیسلام هەر هی خوایە، هەر خوا ئیسلامی ناردوەو خۆی خاوەنی ئیسلامە، مسوڵمانان جەنگ و جیهاد بكەن یان نەكەن.

ئەدی ئایا ئەو دینە چییە كە هەمووی دەبێتە هی خوا، ئەگەر جەنگ و جیهاد بكرێ لە پێناوی خوادا؟ وەڵامەكەی ئەوەیە واتە: لە ڕێی خوادا

---

١) لە كتێبی (چەند بابەتێكی سیاسیی هاوچەرخ لەبەر ڕۆشنایی عەقڵ و وەحی دا) بە درێژی باسی ئەم مەسەلەیەمان كردوە، لە بەشی یەكەم: (تەبایی و پێكەوە ژیان) دا.

جەنگو جیهاد بکەن تاکو وای لێدێ، کە خەڵك بێجگە لە خوا ﷻ، وە بێجگە لە حوکمی دینو شەریعەتی خوا زەختو فشاری کەسی دیکەیان بەسەرەوە نابێ، نەك هەتا هەموویان دینی خوا قەبووڵ دەکەن، چونکە خوا دەفەرموێ: ﴿ لَآ إِكۡرَاهَ فِي ٱلدِّينِ ﴿٢٥٦﴾ ﴾ البقرة، واتە: تۆبزییکردنو زۆرییکردن نیە لە وەرگرتنی دیندا، بەڵێ لێرەدا دین بەمانای گەردنکەچیيو بەمانای طاعەت دێ، یانی: تا وای لیدێ خەڵکی سەر زەوی، یان خەڵکی ئەو شوێنەی کە مسوڵمانان دەیخەنە ژێر ڕکیفی خۆیانەوە، بێجگە لە خوا ﷻ لە هیچ کەسی دیکە ناترسن، وە خواش ﷻ بۆ خۆی بەندەکانی ئازاد کردوە، کە ئایا دینەکەی پەسند دەکەنو پێیەوە پابەند دەبن، یاخود قەبووڵی ناکەن، ئەوە بۆخۆی ئازادو سەرپشکی کردوون، وەك دەفەرموێ: ﴿ وَقُلِ ٱلۡحَقُّ مِن رَّبِّكُمۡۖ فَمَن شَآءَ فَلۡيُؤۡمِن وَمَن شَآءَ فَلۡيَكۡفُرۡۚ ﴿٢٩﴾ ﴾الكهف، واتە: وە بڵێ هەق لە پەروەردگارتانەوەیە، جا کێ دەیەوێ با بڕوابێنێو، کێش دەیەوێ با بێبڕوابێ، هەروەها لە سووڕەتی (یونس)دا دەفەرموێ: ﴿ وَلَوۡ شَآءَ رَبُّكَ لَأٓمَنَ مَن فِي ٱلۡأَرۡضِ كُلُّهُمۡ جَمِيعًاۚ أَفَأَنتَ تُكۡرِهُ ٱلنَّاسَ حَتَّىٰ يَكُونُواْ مُؤۡمِنِينَ ﴿٩٩﴾ ﴾، واتە: ئەگەر پەروەردگارت حەزی کردبا، خەڵکی سەر زەوی هەموویان ئیمانیان دەهێنا، ئایا تۆ زۆریان لێ دەکەیت کە ئیمان بێنن (واتە: ئەی پێغەمبەر) ﷺ تۆ بۆت نیە، چونکە لێرەدا پرسیارکردنی نکوولیيکەران (الإستفهام الإنكاري)یە.

**مەسەلەی سێزدەیەم:** دەربارەی ئەو ڕستەیەی کە دەفەرموێ: ﴿ فَإِنِ ٱنتَهَوۡاْ فَلَا عُدۡوَٰنَ إِلَّا عَلَى ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾، خوا ﷻ دەربارەی کافرەکان قسە دەکات دەفەرموێ: جا ئەگەر وازیان هێنا، ئەوە دەستدرێژیی ناکرێتە سەر غەیری ستەمکاران، ئەم ڕستە قورئانییە دەریدەخات کە ئەهلی کوفر (وەك پێشتریش باسمکرد) بۆیە جەنگیان لەگەڵدا ناکرێ، تا واز لە کوفر بێنن، بەڵکو بۆیە جەنگیان لەگەڵدا

دەکرێ، تا واز لە ستەمو دەستدرێژیی بێنن، بە بەڵگەی ئەوە کە خاوەن کتێبەکانو، هەموو ئەوانەی ئامادەبن ملکەچ بکەن بۆ دەوڵەتی ئیسلامیی‌و، لەژێر سایەیدا ببنە هاووڵاتیی، ئیسلام پێشوازییان لێدەکات، پاشان لە گەرمەی جەنگیشدا کۆمەڵێك خەڵك وەك: ئافرەتو منداڵو کرێکارو پیرو نەخۆش‌و ڕاهیب، ئەوانە هیچیان ناکوژرێن، هەرچەندە کافریش بن، کەواتە: ئەهلی کوفر لەسەر کوفرەکەیان ناکوژرێن بەڵکو لەبەر ستەمەکەیان دەکوژرێن، بۆیە خوای کاربەجێ دەفەرموێ: ﴿فَإِنِ انتَهَوْا فَلَا عُدْوَانَ إِلَّا عَلَى الظَّالِمِينَ﴾، ئەگەر وازیان هێنا لە ستەمو شەڕ فرۆشتن بە مسوڵمانان (با لەسەر کوفری خۆشیان بمێننەوە)، ئەو کاتە نابێت دەستدرێژیی بکرێتە سەر غەیری ستەمکاران.

**مەسەلەی چواردەیەم:** وشەی (عُدْوَانَ) کە لەو ڕستە قورئانییەدا هاتوە کە پێشتر خوێندمانەوە: ﴿فَإِنِ انتَهَوْا فَلَا عُدْوَانَ إِلَّا عَلَى الظَّالِمِينَ﴾، زانایانی ڕەوانبێژیی دەڵێن: لێرەدا مەبەست پێی (مُشاكلة)یە، ئەویش ئەوەیە کە لە زمانی عەرەبیدا شتێك هەیە، کەسێك سیفەتێك لەخۆیدا بەکاربێنێ بەرانبەرەکەشی بەرپەرچی ئەو سیفەتە بداتەوە، هەرهەمان وشە کە بۆ سیفەتی ئەو بەکارهاتوە، بۆ ئەمیش بەکاردێ، با لە نێوەرۆکیشدا لێك جیابن، جا ئەوە مەسەیەکی گرنگە بزانرێ، بۆ نموونە: خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿إِنَّهُمْ يَكِيدُونَ كَيْدًا ﴿١٥﴾ وَأَكِيدُ كَيْدًا ﴿١٦﴾﴾الطارق، واتە: ئەوانە فێڵ دەکەن، منیش فێڵ دەکەم، بە تەئکید ئەو فێڵەی کافران دەیکەن‌و، ئەوەی خوای بەرزو مەزن بۆ خۆی بەکاریهێناوە بە وشەی فێڵ (كَيْدًا) وەك یەك نین‌و نێوەرۆکیان لێك جیایە، یان دەفەرموێ: ﴿وَيَمْكُرُونَ وَيَمْكُرُ اللَّهُ ﴿٣٠﴾﴾الأنفال، ئەوانە مەکر دەکەن‌و خواش مەکر دەکات، لێرەدا مەبەست ئەوەیە: ئەگەر ئەوان فێڵ دەکەن، خواش فێڵەکەی ئەوان هەڵدەوەشێنێتەوە، ئەگەر ئەوان مەکر دەکەن، خوا ﷻ

مەکرەکەی ئەوان هەڵدەوەشێنێتەوە، یان دەفەرموێ: ﴿ يُخَٰدِعُونَ ٱللَّهَ وَهُوَ خَٰدِعُهُمْ ﴿١٤٢﴾ ﴾ النساء، واتە: ئەوانە خوا هەڵدەخەڵەتێنن، خواش ئەوان هەڵدەخەڵەتێنێ، بە تەئکید مەبەست پێی هەمان مانانیە کە بۆ (هەڵخەڵەتاندن)ی ئەوان بەکارهاتوە، جا ئەوە لە زمانی عەرەبیدا پێی دەگوترێ: (موشاکەلە) واتە: هەمان بێژە (لَفظ)و دەربڕین بەکاردەهێنرێتەوە، بەڵام بە واتاو ناوەڕۆکێکی دیکە، کە لەگەڵ ئەو تەرەفەی بەرانبەردا بگونجێ، ئەگەرنا بێگومان بەرپەرچدانەوەی ستەمی ستەمکاران دەستدرێژیی (عُدْوَانَ) نیە، یان کە دەفەرموێ: ﴿ فَمَنِ ٱعْتَدَىٰ عَلَيْكُمْ فَٱعْتَدُوا۟ عَلَيْهِ بِمِثْلِ مَا ٱعْتَدَىٰ عَلَيْكُمْ ﴾ خۆی دەستدرێژیی (إعتداء) ئەوەیە کە مرۆڤ سنووری خۆی ببەزێنێ، جا دیارە ئەوەی کە بەرپەرچی زوڵم دەداتەوە، سنووری خۆی نەبەزاندوە.

**مەسەلەی پازدەیەم:** ئەوە کە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ ٱلشَّهْرُ ٱلْحَرَامُ بِٱلشَّهْرِ ٱلْحَرَامِ ﴾، مانگی حەرام بە مانگی حەرام، مەبەست پێی چییە؟ واتە: شکاندنی مانگی حەرام لە لایەن مسوڵمانانەوە، ئەگەر پێویستی کرد سزای هەڵوێستی کافرانە، کە ئەوان مانگی حەرام دەشکێنن، واتە: ئەوان مانگی حەرامیان شکاندوە، کە مانگە حەرامەکان (رَجَب و ذُوالقَعدَة و ذُو الحِجَّة و مُحَرَّم)، لەسەر ڕای زۆربەی زانایان جەنگیان تێدا حەرامەو مسوڵمان نابێت دەستپێشخەریی بکات، بەڵام ئەگەر کافران دەستپێشخەرییان کردو شەڕیان بە مسوڵمانان فرۆشت، ئەوە خوای دادگەر دەفەرموێ: ﴿ ٱلشَّهْرُ ٱلْحَرَامُ بِٱلشَّهْرِ ٱلْحَرَامِ ﴾، ئەگەر ئەوان حورمەتی مانگی حەرامیان شکاند، ئێوەش بۆ بەرپەرچدانەوەی ئەوان بیشکێنن، هەڵبەتە ئەمەش ئەوەی لێوەردەگیرێ کە ئەگەر ئەوان وایان نەکرد، مسوڵمانان بۆیان نیە حورمەتی مانگە حەرامەکان بشکێنن، وە شەڕیان تێدا بەرپا بکەن بەرانبەر

بە ئەهلی کوفر، مەگەر بۆ بەرپەرچدانەوەو سزادان، ئەگەرنا وەك دەستپێشخەرییکردن دروست نیە، ئنجا وەك لە دەرسی پێشتریش باسمانکرد، بۆ جەنگکردن بە گشتیش هەروایە، ئەگەر کافران دەستپێشخەر نەبن، مسوڵمانان بۆیان نیە دەست پێشخەریی بکەن.

**مەسەلەی شازدەیەم:** ڕستەی: ﴿ وَٱلْحُرُمَٰتُ قِصَاصٌ ﴾، حورمەتەکان تۆڵەن، وەك زانایانی ڕەوانبێژیی دەڵێن: ڕستەکە لە ئەسڵدا بەم شێوەیە: (وَالْحُرماتُ ذَواتُ قِصَاصٍ) حورومەتەکان خاوەن تۆڵەن، کە ئەمە پێی دەگوترێ: (حَذْفِ المُضَافِ)، واتە: هەرکەسێك حورمەتێکی شکاند ئەو حورمەتە تۆڵەی لەسەرە، یاخود دەگونجێ لێرەدا بگوترێ (قِصاص) (مَصْدَر)ە، بەڵام بەمانای (مَفْعُول)ە، واتە: (الْحُرُمَاتُ مُقاصَّةٌ) واتە: حورمەتەکان تۆڵەستاندنەوەیان لەسەرە.

**مەسەلەی حەڤدەیەم:** ڕستەی: ﴿ فَمَنِ ٱعْتَدَىٰ عَلَيْكُمْ فَٱعْتَدُواْ عَلَيْهِ بِمِثْلِ مَا ٱعْتَدَىٰ عَلَيْكُمْ ﴾، ئەوە دەگەیەنێ کە هەرجۆرە ستەمو دەستلرێژییەك، دەبێ وەك خۆی تۆڵەی لێ بکرێتەوە، واتە هەرکاتێك مسوڵمانان بەجۆرێك ستەمیان کرایە سەر، بۆیان هەیە وەك خۆی ئەو دەستلرێژییە بەرپەچ بدەنەوە، کە وەك پێشتر گوتم: لەبەر (مُشَاكَلَة)یە، کە بە مسوڵمانانیش دەگوترێ: ﴿ فَٱعْتَدُواْ ﴾، ئەگەرنا هی ئەوان (إعتدَاء) نیە، چونکە سنووری خۆیان نەبەزاندوە، بەڵام دەبێ چەند دەستلرێژیی کراوە، هەر ئەوەندەش بەرپەرچ بلرێتەوەو نابێ تێیبپەڕێنرێ، پاشان هەموو کاتێکیش مسوڵمانان بۆیان نیە هەمان ستەم کە لێیان دەکرێ، ئەوانیش خودی ئەو شتە لەگەڵ کافراندا بکەنەوە، بەلێ ئەگەر ماڵی مسوڵمانەکانیان برد، بۆیان هەیە ماڵیان ببەنەوە، وە ئەگەر مسوڵمانێکیان کوشت بۆیان هەیە بیانکوژنەوە، وە ئەگەر خاکی مسوڵمانانیان داگیرکرد، بۆیان هەیە وە دەریان بنێن، یاخود ئەوانیش ئەگەر ئەو شوێنەیان پێ ناستێنرێتەوە، لە شوێنێکی دیکە بە ئەندازەی ئەوە

خاکیان لێ داگیربکەنەوە، بەڵام هەندێك شت هەیە کە دەقی شەرعیی هەڵیواردوەو جیای کردۆتەوە، ئەوە بەرپەرچدانەوەی دەستدرێژیی تێدا دروست نیە، بۆ وێنە: ئەگەر ئەوان دەستدرێژیی شەرەفیان کرد، نابێ ئەوانیش بڵێن: ئێمەش دەستدرێژیی شەرەف لەوان دەکەین، یان ئەگەر ئەوان مسوڵمانانیان سووتاند، یاخود جەستەی مسوڵمانانیان هەتك کرد، ئەوانیش بۆیان نیە هەمان شت بکەنەوە، ڕای زۆربەی زانایان ئاوایە.

هەڵبەتە هەرشتێك دەقی لەسەربێ ئەوە پێوەی پابەند دەبین، وە شتێك دەقیشی لەسەرنەبێ، مادام لە مسوڵمانان نەوەشێتەوە، نابێ لەگەڵ ئەهلی کوفردا بیکەن، بۆ وێنە: شێواندنی جەستە، دروست نیە، بەڵگەشمان ئەوەیە کە خوای پەروەردگار کاتێك ئەو ئایەتەی ناردە - کە پاش کەمێکی دیکە دێ- خوار کە پێغەمبەر ﷺ جەنازەی حەمزەی مامی بینی کافرەکان لووت و گوێیان بڕیبوو، کە عەرەب پێی دەڵێن (مثلة) واتە: هەتك کردن، فەرمووی: سوێند بە خوا ئەگەر خوا سەرم بخات، حەفتا کەسیان لێ ئاوا لێدەکەمەوە، واتە: جەستەی حەفتا کەسیان لێ دەشێوێنمەوە، ئیدی خوای کاربەجێ ئەم ئایەتەی ناردە خوار، لەسەر ڕای زۆربەی توێژەرانی قورئان[1]، کە دەفەرموێ: ﴿وَإِنْ عَاقَبْتُمْ فَعَاقِبُوا۟ بِمِثْلِ مَا عُوقِبْتُم بِهِۦ ...﴿١٢٦﴾﴾ النحل، واتە: وە ئەگەر ئێوە کافرەکانتان سزادا، هەر بە ئەندازەی ئەوە کە ئەوان ئێوەیان پێ سزا داوە، ئێوەش هەر ئەوەندە سزایان بدەنەوە، جەستەی یەکێکیان لێ شێواندوون ئێوەش هی یەکێکیان بشێوێننەوە، یان چەندیان شێواندوە، ئێوەش

---

١) بڕوانە: (لُباب النقول في أسباب النزول) للسيوطي رقم: (٦٣٦، ٦٣٧)، ص: (١٤٥)، کە گوتوویەتی: أخرج الحاكم والبيهقي في (الدلائل) والبزّار عن أبي هريرة أنّ رسول الله ﷺ وقف على حمزة استشهد، وقد مُثّل به فقال: (لأُمَثِّلَنّ بسبعين منهم مكانك)، فنزل جبريلُ والنبيُّ واقِفٌ بخواتيم سورة النحل: ﴿وَإِنْ عَاقَبْتُمْ فَعَاقِبُوا۟ بِمِثْلِ مَا عُوقِبْتُم بِهِۦ ...﴾ الى آخر السورة، فكفَّ رسول الله ﷺ وأمسك عمّا أراد، وأخرجه الترمذي وحسّنه، والحاكم عن أبي بن كعب ...

هەرئەوەندە بیشێوێننەوە ﴿ ... وَلَئِن صَبَرْتُمْ لَهُوَ خَيْرٌ لِّلصَّـٰبِرِينَ ﴿١٢٦﴾ ﴾النحل، وە ئەگەر خۆڕاگر بن و وەك ئەوان نەكەن، ئەوە باشترە بۆ ئێوە، دوایی خوای پەروەردگار هەر لەسەری پێویست كرد ﴿ وَٱصْبِرْ وَمَا صَبْرُكَ إِلَّا بِٱللَّهِ ... ﴿١٢٧﴾ ﴾ النحل، واتە: صەبریش بگرەو وەك وان مەكە، وە خۆ ڕاگرییت تەنیا بەهۆی هاوكاریی خواوەیە، ئەوە بوو كە پێغەمبەر ﷺ لە قسەكەی خۆی پەشێمان بۆوەو فەرمووی: خۆڕا دەگرم و واناكەم، هەندێ لە زانایانی ئیسلامیش دەڵێن: ئەو شتانەی كە دەقێكی ڕوون و ڕاشكاویان لەسەر نەبێ، مسوڵمان بۆیان هەیە وەك كافران بكەنەوەو ئەوان چییان لە مسوڵمانان كرد، ئەوانیش لە جەنگ و ڕووبەڕووبونەوەدا وایان لێ بكەنەوە، جگە لەوەی كە دەقی لەسەربێ، وەك مەسەلەی تەعەددای شەڕەف كە بە تەئكید دروست نیە.

**مەسەلەی هەژدەیەم:** هاتنی ڕستەی: ﴿ وَأَنفِقُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ﴾، پاش ڕستەی: ﴿ وَقَـٰتِلُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ٱلَّذِينَ يُقَـٰتِلُونَكُمْ ﴾، لەبەر ئەوەیە كە جەنگ لە ڕێی خوادا بە ڕووح و جەستە ناكرێ، مەگەر ئامادەسازیی بە ماڵ و سامانی بۆ بكرێ، بۆیە خوا ﷻ سەرەتا فەرمانی كردوە بە جەنگكردن لە پێناوی خوادا: ﴿ وَقَـٰتِلُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ٱلَّذِينَ يُقَـٰتِلُونَكُمْ ﴾، وە دوایی باسی ماڵ خەرجكردنی كردوە، چونكە لەڕاستیدا جەنگكردن لە پێناوی خواداو جیهادكردن بە ڕووح، دەبێ جیهادی ماڵیی پێشبكەوێ و، ئەگەر ماڵ و سامان لە ڕێی خوادا نەبەخشرێ و، چەكی پێنەكڕرێ و، كەلوپەلی جیهادی پێنەكڕرێ و، پێداویستییەكانی پێنەكڕرێ، ئەوە بە تەئكید خۆ فیداكردن لە پێناوی خواداو جیهادكردن بە ڕووح و جەستە سەرناگرێ و جێگا ناگرێ.

**مەسەلەی نۆزدەیەم:** خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تُلْقُوا۟ بِأَيْدِيكُمْ إِلَى ٱلتَّهْلُكَةِ ﴾، هەرچەندە هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتە تایبەتە، كە بریتیە لەوەی هەندێك لە مسوڵمانان بیریان لە وازلێهێنانی جەنگ و جیهاد كردبۆوە، وەك ئەبو ئەییوب خوا لێی ڕازی بێت لە هۆی هاتنە خوارەوەكەیدا گێڕاویەتەوەو

پێشتر بە تەفصیل هێنامانو پوختەكەی ئەوەیە كە دەڵێ: ئەو ئایەتە دەربارەی ئێمەی مسوڵمانانی مەدینە هاتە خوار، كە كاتی خۆی لەبەر جەنگو جیهاد نەمان دەپەرژایە سەر موڵكو ماڵو كشتوكاڵو ئاژەڵداریی‌و ئەوانە، دوایی كە ئیسلام بەهێز بوو، گوتمان: با ئاوڕ لە بەرژەوەندییەكانی خۆمان بدەینەوە، جا هەرچەندە ئەم ڕستە قورئانییە لەوبارەوە هاتۆتە خوار، بەڵام لە نێو زانایانی ئیسلامدا بنچینەیەك هەیە دەڵێ: (إِنَّ خُصُوصَ السَّبَبِ لا يَمْنَعُ شُمُولَ الْمَعْنَى)، واتە: تایبەتمەندبوونی هۆكار - هۆكاری هاتنە خوارەوەی ئایەت - ڕێگا ناگرێ لە گشتگیریی واتاكەی، واتە: لێرەدا كە دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تُلْقُوا۟ بِأَيْدِيكُمْ إِلَى ٱلتَّهْلُكَةِ ﴾، هەرچەندە مەبەستی پێ ئەوەبوو كە لە ڕێی خوادا ماڵی خۆتان ببەخشنو، بەهۆی نەبەخشینی ماڵو سامانەوەو بەهۆی نەكردنی جیهادی ماڵییەوە، خۆتان مەفەوتێنن، كە جیهاد نەكەن بە سەروەتو ماڵو سامانو سەرەنجام دوژمن بەسەرتاندا زاڵبێ‌و بفەوتێن، یاخود بەهۆی ئەوەوە كە فەرمانی خوا فەرامۆش دەكەن، گوناهبار ببنو بفەوتێن، بەڵێ هەرچەندە هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتە ئەوەیە، بەڵام ماناكەی گشتییەو، هەموو جۆرە خۆ تووشی گرفتاریی كردنێك دەگرێتەوە، بۆیە دروستە مسوڵمان ئەم ڕستە قورئانییە بەكاربێنێ بۆ هەركەسێك كە بەدەستی خۆی خۆی تووشی گرفتارییەك دەكات، كە پێویستی پێی نیە، یاخود شەرع لەسەری پێویست نەكردوە، وە بۆت هەیە كەسێك كە دەیەوێ خۆی لە شوێنێك هەڵدێرێ، یان كارێك بكات كە بنەتۆوی خۆی ناكاتەوە، پێی بڵێی: بە پێی ئەم ئایەتە كردەوەكەی تۆ حەرامە، چونكە خوا دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تُلْقُوا۟ بِأَيْدِيكُمْ إِلَى ٱلتَّهْلُكَةِ ﴾، بەدەستی خۆتان خۆ مەفەوتێنن.

**مەسەلەی بیستەم:** خوا ﷻ كە دەفەرموێ: ﴿ وَأَحْسِنُوٓا۟ ۛ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴾، وە چاكە بكەن بێگومان خوا چاكەكارانی خۆشدەوێ، ئەم ڕستە قورئانییە تەنیا ماڵ بەخشین ناگەیەنێ، واتە: هەرچەندە سیاقەكە بەلای ئەوەدا دەچێ، واتە ماڵی خۆتان ببەخشنو چاكە بكەن خوا چاكەكارانو ماڵی خۆبەخشەرانی

خۆشدەوێ، بەڵام واتاکەی گشتییە، بۆ وێنە: لە دینداریتدا پوختو چاکبە، نوێژەکەت دەکەی بە چاکیی ئەنجامی بدە، ڕۆژووەکەت بە چاکیی بگرە، حەج دەکەی حەجەکەت بە چاکیی ئەنجام بدە، خێرو صەدەقە دەکەی بە چاکیی بیکە، قورئان دەخوێنی چاکی بخوێنە، صیلەی ڕەحمو خزمایەتی بە شێوەیەکی چاك بکە، لەگەڵ دایكو باوکتدا چاك بە، ئەخلاقو ڕەوشتت جوانبێ ... هتد، بەڵێ وشەی (وَأَحۡسِنُوٓاْ) ئەمانەو غەیری ئەمانەش دەگەینێ، چونکە پێغەمبەر ﷺ پرسیاری لێکراوە دەربارەی (إحسان): {(مَا الإحْسَانُ؟ قَالَ: أَنْ تَعْبُدَ اللهَ كَأَنَّكَ تَرَاهُ، فَإِنْ لَمْ تَكُنْ تَرَاهُ فَإِنَّهُ يَرَاكَ) (رَوَاهُ البُخَارِيُّ برقم: (٥٠)، عَنْ عُمَرَ بْنُ الخَطَّابِ رضي الله عنه}، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (إحسان) ئەوەیە خوا بپەرستی وەك بیبینی {کاتێ کە خوا دەپەرستی بە چاوی دڵ بیبینی} یان بەلای کەمەوە هەست بکەی کە ئەو تۆ دەبینێ، کەواتە: لە عیبادەتیشدا ئیحسان هەیەو چاك خوا پەرستنیش ئیحسانە.

هەروەها پێغەمبەر ﷺ لە فەرموودەیەکی دیکەدا فەرموویەتی: {(إِنَّ اللَّهَ كَتَبَ الإِحْسَانَ عَلَى كُلِّ شَيءٍ، فَإِذَا قَتَلْتُمْ، فَأَحْسِنُوا الْقِتْلَةَ، وَإِذَا ذَبَحْتُمْ، فَأَحْسِنُوا الذَّبْحَ، وَلْيُحِدَّ أَحَدُكُمْ شَفْرَتَهُ وَلْيُرِحْ ذَبِيحَتَهُ) (رَوَاهُ مُسْلِمٌ برقم: (٥٠٢٨)، عَنْ شَدَّادِ بْنِ أَوْسٍ رضي الله عنه}، واتە: خوا تعالى چاکەکردنی لەسەر هەموو شتێك نووسیوە {واتە: هەموو شتێك دەبێ بە شێوەیەکی چاكو بەرێکیی بکرێ، ئنجا وێنە: دێنێتەوە بە دوو شت، کە ئێمە زەینمان بۆیان ناچێ کە ئەوانەش چاککردنو بە پوختیی ئەنجامدانیان تێدا بە مەرج گیرابێ}:

**یەکەمیان:** کوشتن، کە مەبەستی پێ ڕاوکردنی نێچیرە، دەفەرموێ: ئەگەر یەکێتان نێچیرێکی کوشت، با بە جوانیی بیکوژێ {نەچێ هێندەی فیشەکان لێبدا، وەك بێژنگی لێبێ.

**دووەمیشیان:** (سەربڕین)ە، کەسێك ئاژەڵێك، پەڕەورێك سەردەبڕێ، دەفەرموێ}، وە ئەگەر شتێکتان سەربڕی، جوانی سەرببڕن.

پاشان دەفەرموێ: ((وَلْيُحِدَّ أَحَدُكُمْ شَفْرَتَهُ))، واتە: یەکێك لە ئێوە با چەقۆکەی کە پێی سەردەبڕێ، تیژی بکات، نەك بە چەقۆیەکی کول‌و بە خێشەخێش ئەو سەربڕاوە لەژێر دەستیدا مرداربێ‌و تووشی ئەزیەتی زیادە ببێ، وە لە حەدیسی پێغەمبەردا ﷺ هاتوە کە کابرایەکی قەساب لەبەرچاوی ئاژەڵێك کە دەیویست سەری ببڕێ، چەقۆیەکەی تیژ دەکرد، پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: ئایا خوا ڕەحمی لە دڵی تۆ دەرهێناوە، بۆ لەبەرچاوی چەقۆیەکە تیژ دەکەی؟ وە لە کۆتاییدا دەفەرموێ: (وَلْيُرِحْ ذَبِيحَتَهُ)، واتە: با زوو ئەو سەربڕاوەی خۆی ئاسوودە بکات، جا ئەگەر لەم شتانەدا چاك ئەنجامدان بە مەرج گیرابێ، دیارە لە هەموو شتێکی دیکەشدا هەروایەو مسوڵمانان پێویستە بە ڕێکیی بیکەن، وەك پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {(إِنَّ أللهَ تَعَالَى يُحِبّ إِذَا عَمَلَ أَحَدُكُمْ عَمَلاً أَن يَتْقِنَهُ) (رَوَاهُ البيهقي في (الشعب الإيمان) برقم: (٥٣١٢)، عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا، وَحَسَّنَهُ الألباني في (صحيح الجامع) برقم: (٢٧١٠)}، واتە: بێگومان خوای بەرز حەز دەکات ئەگەر یەکێك لە ئێوە کارێکی ئەنجامدا بە وردەکاریی بیکات‌و بە پوختیی‌و ڕێکیی بیکات.

هەروەها خوا، کە دەفەرموێ: ﴿ وَأَحْسِنُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴾، ئەوەش دەگرێتەوە کە لەگەڵ خەڵکیدا چاکەکاربن، قسەت چاك بێت‌و، کردەوەت چاك بێت‌و، ڕەفتارت چاك‌و جوان بێت، لەگەڵ خەڵك چاك بن، بە دەست‌و بە دڵ‌و بە زمان‌و بە ماڵ، سوودیان پێ بگەیەنن.

پاشان لەکاتی جەنگیشدا، ئەم ڕستە قورئانییە ئەوەش دەگرێتەوە، کە لەکاتی جەنگیشدا چاکەکاربن‌و، ئەوەی کە موستەحەقی کوشتن نیە مەیکوژن، وە ئەوەی کە مستەحەقی سزادان نیە، سزای مەدەن، وە ئەگەر کەسێکتان بە دیل گرت، ئەزیەتی مەدەن‌و ئیهانەی مەکەن‌و خزمەتی بکەن، وەك خوای پەروەردگار لەوبارەوە دەفەرموێ: ﴿ وَيُطْعِمُونَ ٱلطَّعَامَ عَلَىٰ حُبِّهِۦ مِسْكِينًا وَيَتِيمًا

وَأَسِيرًا ۝٨ ﴾الإنسان، کە دیارە ئەسیر ئەوکاتە هەر کافر بووە، بەڵام خوا دەفەرموێ: ئەو خواردنەی کە زۆریان خۆشدەوێ‌و بۆخۆیان پێویستییان پێی هەیە، دەیدەن بە نەدارو هەتیوو و دیل، هەروەها کۆمەڵێك ئەدەب‌و ڕەوشتی بەرزو جوان کە لە ئیسلامدا هاتوون‌و پێویستە جەنگاوەرانی مسوڵمان خۆیانیان پێ برازێننەوە، ئەوانە هەموویان دەچنە نێو ئەم ڕستە قورئانییەوە: ﴿وَأَحْسِنُوٓاْۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴾، بەڵێ مسوڵمان دەبێ کە جەنگیش دەکات، جەنگاوەرێکی چاکەکاربێت، جەنگاوەرێکی جوامێر بێت، (صَلاَح الدین)ی ئەییوبیی ڕەحمەتی خوای لێبێ، ڕۆژئاواییەکان لەزۆر کتێبدا باسی جوامێریی‌و ڕەوشت بەرزیی ئەو پیاوەیان کردوە، چونکە پیاوێکی زۆر لێبوردەو بە ڕەحم‌و ڕەوشت بەرز بووە لەگەڵ ئەوانەدا کە لە بەرانبەریدا تێکشکاون، یەکێك لە سەرکردەکانی کافرەکان کە تێکشکابوو ئەسپەکەی لە بندا کوژرابوو (صَلاَح الدین) ئەسپێکی بۆ ناردو شمشێرێکیشی بۆ نارد، وە کاتێك یەکێکی دیکەیان بریندارببوو بوو، بەفری بۆ ناردو دکتۆری بۆ نارد، بۆ ئەوەی چاکی بکاتەوە، وە هەرگیز بریندارو دیل‌و ژن‌و منداڵی نەدەکوشت، بۆیەش هەمیشە سوپای ئیسلام ئەگەر پابەند بووبن بە شەریعەتەوە، پێش ئەوەی کە قەڵاکان فەتح بکەن، دڵی خەڵکیان فەتح دەکردو، خەڵك تەماشای ئەخلاق‌و ڕەوشتی بەرزو جوانی مسوڵمانانیان دەکردو دەیانگوت: ئەگەر جەنگاوەرەکانیان وابن لە حاڵەتی جەنگدا، دەبێ لە حاڵەتی ئاساییدا چۆنبن ؟!

**مەسەلەی بیست‌و یەکەم:** کە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿وَلَا تُلْقُواْ بِأَيْدِيكُمْ إِلَى ٱلتَّهْلُكَةِ ﴾، زاناو شەرعزانان لە کاتی توێژینەوەی ئەم ئایەتەدا باسی مەسەلەی خۆفیداکردنیان کردوە، کە ئایا حوکمەکەی چۆنە؟! بۆ وێنە: کەسێك خۆی بکوتێتە ڕیزی دوژمنەوە، کە دیارە کەسێ بەتەنیا بچێتە نێو ڕیزی دوژمنەوە، ئەگەری زۆری هەیە کە بەساغی نەیەتەوە، ئنجا ئایا بۆچی بۆ وا دەکات؟ بۆ ئەوەی چاوی دوژمن بشکێنێ‌و سوپای دوژمن بزانێ کە مسوڵمانان لە مردن

ناترسێن‌و فیداكارن، دیارە شەرعزانان باسیان كردوە، كە چ كاتێك كردەوەی فیدایی دروستە، زۆربەیان دەڵێن: لەكاتی جەنگدا لە كاتێكدا ئەو هەڵوێستە زیان بە دوژمن بگەیەنێ‌و چاوی بشكێنێ‌و مەعنەوییاتیان برووخێنێ، یاخود بزانێ كە زەبریان لێ دەدا، یاخود ئەگەری زۆری هەبێت كە دەتوانێ بچێتە نێویان‌و بشگەڕێتەوە، لەو كاتەدا دروستە، ئەدی چ كاتێك دروست نیە؟ كاتێك دروست نیە كە بزانێ زیانیان پێ ناگەیەنێ‌و خۆیشی سەلامەت نابێ، ئەو كاتە دروست نیە، بەڵام لێتان تێكنەچێ ئەوە كاتێك دروستە كە دوژمنان لە بەرانبەردا وەستاون‌و شەڕ دەكەن، ئەگەرنا دروست نیە كابرا بچێ بڵێ: كارێكی فیدایی دەكەم‌و لە شوێنێك خۆی بتەقێنێتەوە، بۆ وێنە: چایخانەیەك كە خەڵكی گشتی لێیە، یاخود سەیارەیەك لە شوێنێك بتەقێنێتەوە كە خەڵكی لاشەڕی پێدا دەڕوات، ئەوانە هیچیان دروست نین، بەڵام دروستە مسوڵمان هێرش بكاتە سەر سوپای دوژمن‌و خۆی فیدا بكات، با بشزانێ كە سەری خۆی لەسەر دادەنێ، بەمەرجێك بزانێ كە زیان بە دوژمن دەگەیەنێ، با تەنیا مەعنەوییات رووخاندن‌و چاوشكاندنیشیان بێت، یاخود قەناعەتی وابێ كە دەتوانێ بە سەلامەتی بگەڕێتەوە، وە لە جەنگەكانی ئیسلام لەگەڵ ئەهلی كوفردا، ئەو حاڵەتە بووە، یەكێك لەوانە لە شەڕی یەمامەدا كە مسوڵمانان بە فەرماندەیی خالیدی كوڕی وەلید لە سەردەمی (أبوبكر الصديق)دا خوا لێی ڕازی بێ، شەڕیان دەكرد لەگەڵ (مسيلمة الكذاب)دا، قەڵایەكیان هەبوو بۆیان نەدەگیرا، زۆر خەڵك خەریك بوون بۆیان نەدەگیرا، دوایی یەكێك لە هاوەڵان بە ناوی بەڕائی كوڕی مالیك، گوتی: بێنن من لەسەر قەڵغانێكی خۆتان دابنێن‌و بە ڕمەكانتان بەرزم بكەنەوەو هەڵمدەنە ئەودیوی قەڵایەكەو لێمگەڕێن، جا ئەگەر سەلامەت بووم، لەودیو دەرگاكەتان بۆ دەكەمەوەو، ئەگەر سەلامەتیش نەبووم، ئەوە خوا لێم خۆشبێ‌و شەهید دەبم، ئەوەبوو لەسەر قەڵغانێكیان دانا وە هەڵیاندایە ئەو دیوی قەڵایەكە، كە شوورەیەكی بەرزی هەبوو، بەڕاء

بۆخۆی دەگێڕێتەوە، دەڵێ: کە کەوتم لاقێکم شکا، بەڵام بە شەلەشەل ڕۆیشتم ئەوانەی لەبەر دەرگاکە بوون کوشتمن، وە دەرگاکەم لە پشتەوە کردەوەو سوپای ئیسلامیش هاتە ژوورێ، بەو شێوەیە ئەو قەڵایە گیرا، بە هەرحاڵ لەو جۆرە حاڵەتانەدا کردەوەی فیدایی دروستەو ئەو کاتە ئەم ڕستە قورئانییە نایگرێتەوە، کە دەفەرموێ: ﴿وَلَا تُلْقُواْ بِأَيْدِيكُمْ إِلَى ٱلتَّهْلُكَةِ﴾، چونکە ئەو کەسە بەدەستی خۆ خۆی نەفەوتاندووە، مەبەستی خۆ فەوتاندن نەبووە، بەڵکو مەبەستی دوژمن فەوتاندن بووەو، مەبەستی ئەوەبووە، کە چاوی دوژمن بشکێنێ.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی چلەمین

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان هەشت ئایەت لەخۆی دەگرێ، لە ئایەتی ژمارە (١٩٦ تاكو ٢٠٣)، وە ئەم هەشت ئایەتە هەموویان باسی حەج‌و عومرە دەكەن، چۆنیەتی ئەنجامدانی حەج‌و عومرەو كۆمەڵێك یاساو ئەدەبی شەرعیی كە پەیوەندییان بەو دوو خواپەرستییە گەورەوە هەیەو لە درێژەی بڕگەكانی دەرسەكەماندا تیشكیان دەخەینە سەر.

﴿ وَأَتِمُّواْ ٱلْحَجَّ وَٱلْعُمْرَةَ لِلَّهِۚ فَإِنْ أُحْصِرْتُمْ فَمَا ٱسْتَيْسَرَ مِنَ ٱلْهَدْيِۖ وَلَا تَحْلِقُواْ رُءُوسَكُمْ حَتَّىٰ يَبْلُغَ ٱلْهَدْيُ مَحِلَّهُۥۚ فَمَن كَانَ مِنكُم مَّرِيضًا أَوْ بِهِۦٓ أَذًى مِّن رَّأْسِهِۦ فَفِدْيَةٌ مِّن صِيَامٍ أَوْ صَدَقَةٍ أَوْ نُسُكٍۚ فَإِذَآ أَمِنتُمْ فَمَن تَمَتَّعَ بِٱلْعُمْرَةِ إِلَى ٱلْحَجِّ فَمَا ٱسْتَيْسَرَ مِنَ ٱلْهَدْيِۚ فَمَن لَّمْ يَجِدْ فَصِيَامُ ثَلَٰثَةِ أَيَّامٍ فِى ٱلْحَجِّ وَسَبْعَةٍ إِذَا رَجَعْتُمْۗ تِلْكَ عَشَرَةٌ كَامِلَةٌۗ ذَٰلِكَ لِمَن لَّمْ يَكُنْ أَهْلُهُۥ حَاضِرِى ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَٱعْلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ ﴿١٩٦﴾ ٱلْحَجُّ أَشْهُرٌ مَّعْلُومَٰتٌۚ فَمَن فَرَضَ فِيهِنَّ ٱلْحَجَّ فَلَا رَفَثَ وَلَا فُسُوقَ وَلَا جِدَالَ فِى ٱلْحَجِّۗ وَمَا تَفْعَلُواْ مِنْ خَيْرٍ يَعْلَمْهُ ٱللَّهُۗ وَتَزَوَّدُواْ فَإِنَّ خَيْرَ ٱلزَّادِ ٱلتَّقْوَىٰۚ وَٱتَّقُونِ يَٰٓأُوْلِى ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿١٩٧﴾ لَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَن تَبْتَغُواْ فَضْلًا مِّن رَّبِّكُمْۚ فَإِذَآ أَفَضْتُم مِّنْ عَرَفَٰتٍ فَٱذْكُرُواْ ٱللَّهَ عِندَ ٱلْمَشْعَرِ ٱلْحَرَامِۖ وَٱذْكُرُوهُ كَمَا هَدَىٰكُمْ وَإِن كُنتُم مِّن قَبْلِهِۦ لَمِنَ ٱلضَّآلِّينَ ﴿١٩٨﴾ ثُمَّ أَفِيضُواْ مِنْ حَيْثُ أَفَاضَ ٱلنَّاسُ

وَٱسْتَغْفِرُواْ ٱللَّهَ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١٩٩﴾ فَإِذَا قَضَيْتُم مَّنَٰسِكَكُمْ فَٱذْكُرُواْ ٱللَّهَ كَذِكْرِكُمْ ءَابَآءَكُمْ أَوْ أَشَدَّ ذِكْرًا فَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَقُولُ رَبَّنَآ ءَاتِنَا فِى ٱلدُّنْيَا وَمَا لَهُۥ فِى ٱلْءَاخِرَةِ مِنْ خَلَٰقٍ ﴿٢٠٠﴾ وَمِنْهُم مَّن يَقُولُ رَبَّنَآ ءَاتِنَا فِى ٱلدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِى ٱلْءَاخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ ﴿٢٠١﴾ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمْ نَصِيبٌ مِّمَّا كَسَبُواْ وَٱللَّهُ سَرِيعُ ٱلْحِسَابِ ﴿٢٠٢﴾ وَٱذْكُرُواْ ٱللَّهَ فِىٓ أَيَّامٍ مَّعْدُودَٰتٍ فَمَن تَعَجَّلَ فِى يَوْمَيْنِ فَلَآ إِثْمَ عَلَيْهِ وَمَن تَأَخَّرَ فَلَآ إِثْمَ عَلَيْهِ لِمَنِ ٱتَّقَىٰ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَٱعْلَمُوٓاْ أَنَّكُمْ إِلَيْهِ تُحْشَرُونَ ﴿٢٠٣﴾ ﴾

## مانای وشە بە وشەی ئایەتەکان

((وە حەجو عومرە بۆ خوا بەتەواویی ئەنجام بدەن، وە ئەگەر ڕێتان لێگیرا، ئەوا قوربانییەك كە ئاسانە (سەر ببڕن)، وە سەری خۆتان مەتاشن هەتا قوربانییەكە نەگاتە شوێنی خۆی، وە هەركامێكتان نەخۆش بوو، یان ئازارێك لەسەری دابوو، با (قژی لاببات و) فیدیەیەك لە ڕۆژووگرتن یان خێرو بەخشین، یان قوربانی بدات، وە هەر كات بێ ترس بوون، هەركەسێك پاش عومرە حەجی كرد، ئەوە قوربانییەكی ئاسانی لەسەرە، وە هەركەسێك چنگی نەكەوت، با سێ ڕۆژان لە حەجێ و حەوتیش كە گەڕانەوە بگرێ، ئەوە (دە)ی تەواو، ئەوەش بۆ كەسێكە كە ماڵ و خێزانی لە نزیك مزگەوتی حەرام نەبێ، وە پارێز لە خوا بكەن و بزانن خوا سزای توندە ﴿١٩٦﴾ كاتی ئەنجامدانی حەج مانگانێكی زانراوە، جا هەركەسێك بڕیاری حەجی تێیاندا دا، نابێ لەكاتی حەجدا باسی جیماع و گوناهو شەڕە قسە هەبێ، وە هەر چاكەكیش بكەن خوا دەیزانێ، وە توێشوو هەڵگرن، وە باشترین توێشووش پارێزكارییە، وە ئەی خاوەن عەقڵان! پارێزم لێ بكەن ﴿١٩٧﴾ هیچ گوناهتان ناگا (ئەگەر لەكاتی حەجدا) لە بەخششی پەروەردگارتان بخوازن (و بازرگانیی بكەن) جا هەركات لە عەرەفاتەوە

شۆڕبوونەوە، ئەوە لەلای مەشعەری حەرام (موزدەلیفە) یادی خوا بکەن، وە یادی بکەنەوە وەك چۆن ڕێنمایی کردوون، لە حاڵێکدا کە پێشتر سەرگەردان بوون ﴿١٩٨﴾ پاشان هەر لەو شوێنەوە کە خەڵك شۆڕدەبنەوە، شۆڕبنەوەو داوای لێبوردنیش لە خوا بکەن، بێگومان خوا لێبوردەی بە بەزەیی یە ﴿١٩٩﴾ ئنجا کە ئەرکەکانی حەجی خۆتان ئەنجامدان، وەك یادی باب‌و باپیرانتان یان زیاتریش یادی خوا بکەن، جا لەنێو خەڵکیدا هی وا هەیە دەڵێت: پەروەردگارمان لە دنیا پێمان ببەخشە، بەڵام لە دوارۆژدا هیچ پشکی نیە ﴿٢٠٠﴾ وە هەشیانە دەڵێت: پەروەردگارمان لە دنیادا چاکەو لە دوارۆژیشدا چاکەمان بدەوەو لە ئازاری ئاگر بمانپارێزە، ﴿٢٠١﴾ ئەوانە پشك‌و پاداشتی ئەوەیان هەیە، کە وەدەستیان هێناوە، وە خوا لێپرسینەوەی خێرایە ﴿٢٠٢﴾ وە لە ڕۆژانێکی کەمدا یادی خوا بکەن، جا هەرکەسێك پەلەی کردو لە دوو ڕۆژاندا کردی، ئەوە گوناهی ناگات، ئەوەش کە دواکەوت (واتە: هەموو ڕۆژەکان یادی خوای کرد) گوناهی ناگات، مادام پارێز بکات، وە پارێز لە خوا بکەن‌و بزانن، کە بۆ لای وی کۆدەکرێنەوە ﴿٢٠٣﴾)).

## شیکردنەوەی هەندێك لە وشەکان

(**وَأَتِمُّواْ**): واتە: تەواویان بکەن، یان بەتەواویی بیانکەن، (تَمَامُ الشَيءِ: إنتِهَاؤُهُ إلَى حَدٍ لا يُحْتَاجُ إلَى شَيءٍ خَارِجٍ عَنْهُ بِخِلافِ النَاقِصِ)، واتە: (تَمَامُ) یانی: تەواوکردنی شتێك بە جۆرێك کە پێویستی بە دەرەوەی خۆی نەبێ.

(**الْحَجَّ**): (أَصْلُ الحَجِّ: القَصْدُ لِلزِيَارَةِ) مەبەست کردنی سەردانە (وَخُصَّ فِي تَعَارُفِ الشَّرْعِ بِقَصْدِ بَيْتِ اللهِ تَعَالَى إقَامَةً لِلنُّسُكِ)، بەڵام لە زاراوەی شەرعدا (حج)، واتە: مەبەست هەبوون بۆ سەردانی ماڵی خوا بە مەبەستی ئەنجامدانی خوا پەرستییەکانی حەج.

(وَٱلْعُمْرَةَ): (الإعتمـارُ والعُـمْرَة الزِيـادَةُ، وَفـي الـشَّرْع: العَـقْدُ الْمَخْـصُوص) لـە ئەسـڵی زمانـدا وشـەی (عمـرة) واتـە: سـەردان، بـەڵام لـە زاراوەی شـەرعدا سەردانێكی تایبەتـە كە لەگـەڵ حەجـدا دەكـرێ.

(أُحْصِرْتُمْ): (الْحَـصْرُ: التَـضييقُ، والإحْـصَارُ: الْمَنْـعُ مِـنْ طَرِيـق البَيْـتِ، ظَـاهِراً وَ باطِنـاً، والْحَـصْرُ فـي البَاطـنِ فَقَـطْ)، وشـەی (حَـصْرُ)، واتـە: تـەنگ پـێ هەڵـچنین، بـەڵام (إحْـصَار)، واتـە: ڕێ لێگیـرانی چـوون بـۆ حـەج بەشـێوەی پەنهانیی كە ئەوەیە مرۆڤ بتـرسێنرێ‌و، بە ڕواڵەتیی ئەوەیە كە بەربەسـتێك هەبێت نەتوانێ حەجەكـەی بكـا.

(ٱسْتَيْسَرَ): (اليُسر: ضِدُّ العُسر وَتَيسر كَـذا وَاستيسر أي: تسهَّلَ)، واتە: (يُسر) دژی زەحمەتـە، وە (تَيسر) یانی: ئەو شتە ئاسـان بـوو، هـەروەها (استيسـر)ش هەمان مانای هەیـە.

(ٱلْهَدْيِ): (وَالْهَـدْيُ: مُخـتَصٌّ بِمَـا يُهْـدَى إلـى البَيْـتِ، قَـالَ الأَخفـش: والوَاحِـدَةُ هَدِيّةٌ)، وشـەی (هَدْيُ) كـۆ (جمع)یـەو تاكەكـەی (هَدِيّةُ)یـە، كـە بریتیـە لـەو ئاژەڵەی هەدیـە دەكـرێ بۆ بەیـتو لـەوێ سەردەبڕدرێ.

(فَفِدْيَةٌ): (مَا يَقِي بِهِ الإنْسَانُ نَفْسَـهُ مِن مَال يَبْذُلُـهُ في عِبـادَةٍ قَصَّرَ فِيها يُقَـالُ لَهُ فِديةُ) واتـە: (فِديةُ) بریتیـە لـە ماڵـێك كە دەكرێتـە قـەرەبوو، بـۆ ئـەنجام نەدانی یەكێك لە خواپەرستییەكانی حەج، واتـە: كەسێك شتێكی بـۆ ئـەنجام نـەدرا لـە فەرزەكـانی حـەج، فیدیـە دەدات، فیدیەكـەش دیـارە سێ شتە: یـان ڕۆژووگـرتن، یاخـود خێـرو مـاڵ بەخشـینێكە، یاخـود سـەربڕینی ئاژەڵێكـە.

(تَمَتَّعَ): واتـە: عومرەی كـرد لەگـەڵ حـەج، هەركەسێ عـومرە لەگـەڵ حـەج بكـات، حەجەكـەی پێـی دەگوترێـت: حەجـی (تَمَتّع)، (فمن تَمَتّع إلـى الحـج) واتـە: هـەركەس عومرەی هێنـایە لای حـەج.

(فَرَضَ): (عَيّنَ وَقتَهُ) کاتەکەی دیاری کرد.

(رَفَثَ): (الرَّفَثُ: كَلامٌ مُتَضَمِّنٌ لِمَا يُستَقبَحُ ذِكْرُهُ مِن ذِكْرِ الجِمَاعِ، وَدَوَاعِيهِ، وَجُعِلَ كِنَايَة عَنِ الجِمَاعِ)، واتە: وشەی: (رَّفَثْ) بریتیە لە هەر قسەیەکی ناشیرین کە بەلای جینس دابچێ، جاری واش هەیە (كِنَاية)یە بۆ خودی کاری جینسیی، (جووتبوونی پیاو لەگەڵ خێزانی).

(أَفَضْتُم): (أَي: دَفَعتُم مِنهَا بِكَثرةٍ تشبيهاً بفَيضِ المَاءِ)، واتە کە ڕژانە خوارێ بە لوزەوو بە زۆریی، وێچواندنە بە هەڵڕژانی ئاو.

(ٱلْمَشْعَرِ ٱلْحَرَامِ): (مَشْعَر) کۆیەکەی (مَشَاعِر)ە، واتە: نیشانەکانی حەج، وە (المَشعَرِ الحَرَامِ) مەبەست پێی موزدەلیفەیە، یاخود شوێنێکە لە موزدەلیفە.

(مَّنَاسِكَكُمْ): کۆی (مَنسَک)ە، و (نُسُک)یش، واتە: عیبادەت، وە وشەی (مَناسک) واتە: شوێنەکانی عیبادەت، یاخود خودی خوا پەرستییەکان، بەتایبەت خوا پەرستیەکانی حەج.

(أَيَّامٍ مَّعْدُودَاتٍ): مەبەست پێی ڕۆژەکانی (تَشْريق)ە، واتە: ڕۆژی (١١و ١٢و ١٣) لە مانگی (ذي الحِجة).

## هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتەکان

١) هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ڕستە قورئانییەی، کە دەفەرموێ: ﴿فَإِنْ أُحْصِرْتُمْ فَمَا ٱسْتَيْسَرَ مِنَ ٱلْهَدْيِ﴾، قال إبن كثير:[1] {(نَزَلَتْ في سَنَةِ ستٍ أي عَامِ الحُدَيبِيَة حين حَال المُشرِكُون بَيْنَ رَسولِ اللهِ ﷺ وَبَيْنَ الوُصُولِ إلى البَيْتِ)}، واتە: ئەم ڕستە قورئانییەی کە دەفەرموێ: ئەگەر ڕێتان لێگیرا بۆ

١) (المِصبَاحُ المُنير في تَهذيب تفسير ابن كثير، ص (١٩٦).

چوونە حەج، فیدیە بدەن، لە ساڵی شەشەمی كۆچی، واتە: لە كاتی صوڵحی حودەیبییەدا هاتە خوار، كە موشریكەكان ڕێگایان لە پێغەمبەر ﷺ گرت، كە بگاتە (بێت) و لەوێ عومرەكەی تەواو بكات.

٢) هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ڕستە قورئانییەی، كە دەفەرموێ: ﴿فَمَن كَانَ مِنكُم مَّرِيضًا أَوْ بِهِۦٓ أَذًى مِّن رَّأْسِهِۦ فَفِدْيَةٌ مِّن صِيَامٍ أَوْ صَدَقَةٍ أَوْ نُسُكٍ﴾، {(عَنْ كَعْبِ بنِ عُجْرَةَ وَقَفَ عَلَيَّ رَسولُ ﷺ بِالحُدَيبِيَةِ وَرَأسِي يَتَهَافَتُ قَمْلاً فَقَالَ: (يُؤْذِيكَ هَوَامُّكَ؟!) قُلْتُ: نَعَمْ، قَالَ: فَاحْلِقْ رَأسَكَ أو قَالَ: (احْلِقْ)، قَالَ: فِيَّ نَزَلَتْ هَذِهِ الآيَة. ﴿فَمَن كَانَ مِنكُم مَّرِيضًا .... إلى آخرِهَا﴾، فَقَالَ: النَّبِيُّ ﷺ (صُمْ ثَلاثَةَ أَيّامٍ، أو تَصَدَّقْ بِفَرَقٍ بَينَ ستةٍ، أَو انْسُكْ بِمَا تَيَسر) (مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ البُخاري برقم: (١٨١٥)، ومُسلم برقم: (٢٨٧٤)}، واتە: كەعبی كوڕی عوجرە دەڵێ: لە صوڵحی حودەیبییەدا پێغەمبەر ﷺ لە سەرم وەستا بوو، كە ئەسپێ لەسەرمدا دەكەوتنە خوار (واتە: سەرم دژوێن بوو) ئەویش فەرمووی: ئەو زیندەوەرانەی سەرت ئەزیەتت دەدەن؟ گوتم: بەڵێ،فەرمووی: سەرت بتاشە، دوایی، یان سێ ڕۆژان بەڕۆژووبە، یان خواردنی شەش فەقیران بدە، یاخود چیت دەست دەكەوێت لە ئاژەڵ سەری ببڕە (یانی: بزنێك یان مەڕێك).

٣) هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ڕستە قورئانییەی، كە دەفەرموێ: ﴿وَتَزَوَّدُوا۟ فَإِنَّ خَيْرَ ٱلزَّادِ ٱلتَّقْوَىٰ﴾، {(عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: كَانَ أَهْلُ اليَمَنِ يَحُجُّونَ وَلاَيَتَزَوَّدُونَ، وَيَقُولُونَ: نَحْنُ المُتَوَكِّلُونَ، فَإذَا قَدِمُوا مَكّةَ سَأَلُوا النَّاسَ، فَأَنزَلَ اللهُ تَعَالى: ﴿وَتَزَوَّدُوا۟ فَإِنَّ خَيْرَ ٱلزَّادِ ٱلتَّقْوَىٰ﴾) (رَوَاهُ البُخاري برقم: (١٥٢٣)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (١٧٣٠)، وابن جريرو غَيرهُم}، واتە: عەبدوڵڵای كوڕی عەبباس دەڵێ: ئەم ڕستە قورئانییە دەربارەی خەڵی یەمەن هاتە خوار، ئەهلی یەمەن دەهاتنە حەج، بەڵام خواردنیان لەگەڵ خۆیاندا نەدەهێنا، دەیانگوت: ئێمە پشت بە خوا بەستووانین، دوایی كە دەهاتنە مەدینە (برسی دەبوون)

سواڵیان دەكرد، جا خوای بەرز ئەم ڕستە قورئانییەی نارده خوار: ﴿ وَتَزَوَّدُواْ فَإِنَّ خَيْرَ ٱلزَّادِ ٱلتَّقْوَىٰ ﴾، ئەگەر حەجتان كرد، توێشوو لەگەڵ خۆتاندا بەرن، باشترین توێشووش تەقوایە، دیارە بەشێك لە تەقواش ئەوەیە كە تۆ سواڵ نەكەی‌و چاوت لەدەستی خەڵكی نەبێت، بەڵێ بەشێك لە تەقوا ئەوەیە، كە تۆ بە ڕەنجی شانی خۆت خۆت بژێنی‌و، چاوت لە دەستی خەڵكی نەبێت.

(٤)- هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ڕستە قورئانییەی، كە دەفەرموێ: ﴿ لَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَن تَبْتَغُواْ فَضْلًا مِّن رَّبِّكُمْ ﴾، {(عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا قَالَ: كَانَتْ عُكَاظٌ وَمَجِنَّةُ وَذُوالمَجَازِ أَسواقاً فِي الجَاهِلِيَّةِ، فَلَمَّا جَاءَ الإِسلامُ، تأَثَّموا أن يَتَّجِروا في الْمَوَاسم فَسَأَلوا رَسولَ الله ﷺ عَنْ ذَلِكَ فَنَزَلَتْ هَذِهِ الآيـة) (رَوَاهُ البُخَارِيُّ برقم: (٢٠٥٠)}، واتە: عەبدوڵڵای كوڕی عەبباس خوا لێیان ڕازی بێ دەڵێ: لە سەردەمی نەفامییدا موشریكەكان چەند بازاڕێكیان هەبوو (عُكاظ، مجنة، ذو المجاز) كاتێك ئیسلام هات لەبەر ئەوەی پێشتر لەم بازاڕانەدا شتی ناشەرعیی كراوە، پێیان وابووە گوناهبار دەبن، ئەگەر بازرگانییان تێدا بكەن‌و لەوبارەوە پرسیاریان لە پێغەمبەری خوا كرد، ئەم ئایەتە هاتە خوارێ، كە دەفەرموێ: ﴿ لَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَن تَبْتَغُواْ فَضْلًا مِّن رَّبِّكُمْ ﴾، واتە: گوناحتان ناگات كە لە حەجیشدا بازرگانیی‌و مامەڵە بكەن، وەك كوردەواریی خۆمان دەڵێن: (هەم زیارەت‌و هەم تیجارەت).

٥) هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ڕستە قورئانییەی، كە دەفەرموێ: ﴿ ثُمَّ أَفِيضُواْ مِنْ حَيْثُ أَفَاضَ ٱلنَّاسُ وَٱسْتَغْفِرُواْ ٱللَّهَۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴾، {(عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا قَالَتْ: كَانَتْ قُرَيشُ وَمَنْ دَانَ دِينَهَا يَقِفُونَ بِالمُزْدَلِفَةِ، وَكَانوا يُسَمَّونَ الحُمْسَ، وَكَانَ سَائِرُ العَرَبِ يَقِفُونَ بِعَرَفَاتٍ، فَلَمَّا جَاءَ الإِسلامُ، أَمَرَ اللهُ نَبِيَّهُ ﷺ أَنْ يأَتيَ عَرَفَاتٍ، ثُمَّ يَقِفَ بِهَا، ثُمَّ يُفِيضَ مِنْهَا فَذَلِكَ قَوْلُهُ تعالى: ﴿ أَفِيضُواْ مِنْ حَيْثُ أَفَاضَ ٱلنَّاسُ ﴾) (رَوَاهُ البُخَارِيُّ

برقم: (٤٥٢٠)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٢٩٤٥)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (١٩١٠)، وَالنَّسَائِيُّ برقم: (٣٠١٢)، واختارهُ ابن جرير}، واتە: دایکمان عائیشە خوا لێی ڕازی بێ دەگێڕێتەوە دەڵێ: موشریکەکان لە سەردەمی نەفامییدا خۆیان و ئەوانەی لەگەڵیاندا بوون، عادەتیان وابوو بۆ ڕاوەستان لە عەرەفات نەدەگەیشتنە عەرەفات و، هەر لە موزدەلیفە ڕادەوەستان، دەیانگوت: ئێمە ئەهلی بەیت و حەرەمین و لەوە گەورەترین وەك خەڵکی دیکە بوەستین {خۆیان پێ لە خەڵکی زلتر بوو، خەڵکی دیکە هەموو دەچوون لە عەرەفات ڕادەوەستان، دیارە ئەو خواپەرستییانەی حەج لە سەردەمی نەفامییشدا زۆربەیان هەر هەبوون، بەڵام بە ناوێکی دیکە جێبەجێیان کردوون، یاخود شیرك و بت پەرستیان تێکەڵ کردوون، ئنجا کە ئیسلام هات خوا ﷻ کە پێغەمبەری نارد، فەرمانی پێکرد کە هەموویان بچن لە عەرەفات ڕابوەستن، بۆیە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَٱسْتَغْفِرُوا۟ ٱللَّهَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴾، داوای لێبوردنیش لە خوا بکەن، کە تا ئێستا واتان نەکردوەو، خۆتان پێ لە خەڵکی زلتر بووە.

٦) هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ڕستە قورئانییەی، کە دەفەرموێ: ﴿ فَإِذَا قَضَيْتُم مَّنَـٰسِكَكُمْ فَٱذْكُرُوا۟ ٱللَّهَ كَذِكْرِكُمْ ءَابَآءَكُمْ أَوْ أَشَدَّ ذِكْرًا ﴾، {(قَالَ: مُجاهِد: كانَ أَهل الجاهلية إذا اجتَمَعُوا بِالمَوْسم ذكروا فِعْل آبائهُم في الجَاهِلِية، وَأيامهم وأَنْسَابهم، فَتَفَاخَرُوا، فَأَنزَلَ الله هَـٰذِهِ الآيـة ...) (لُباب النقول للسيوطي ص: (٤١)}، واتە: موجاهید دەڵێ: عەرەب لە سەردەمی نەفامییدا کە لەکاتی حەجدا کۆدەبوونەوە (بەتایبەت لە موزدەلیفەو لە میناو لەو شوێنانەی کە خەڵکیان تێدا کۆدەبێتەوە) باسی باب و باپیرانی خۆیانیان دەکردو، باسی ئەو ڕۆژانەیان دەکرد کە شەڕیان تێدا کردون و سەرکەوتووبوونەو، باسی نەسەب و ڕەچەڵەکی خۆیانیان دەکردو، شانازییان بەسەریەکدا دەکرد، ئیدی خوا ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە: ﴿ فَإِذَا قَضَيْتُم مَّنَـٰسِكَكُمْ فَٱذْكُرُوا۟ ٱللَّهَ كَذِكْرِكُمْ ءَابَآءَكُمْ أَوْ أَشَدَّ ذِكْرًا ﴾، واتە: ئەگەر خواپەرستییەکانی حەجتان

تـەواوکردن {لـە مینـا و لـەو شـوێنانەدا کـە خواپەرسـتییەکانی حـەجیان تێـدا دەکرێن، کۆبوونەوە} یادی خوا بکەن، وەك چۆن یادی بـاب‌و باپیـرانتان دەکـەن، بەڵکو زیاتریش، واتە: کـەس خـۆ هەڵـنەکێشـێ بەسـەر ئـەوانی دیکـەداو مـەدحی باب‌و باپیـرانی خۆی‌و نەسەب‌و ڕەچەڵـەکی خۆی بکات، بەڵکو یادی خوا بکەن.

## مانـــای گشـــتی ئایەتەکـــان

خـوا ﷻ دوای ئـەوەی فـەرمانی بـە بـڕواداران کـرد بـە کۆمەڵـێك ئـەرك، لـە ئایەتەکانی پێشـوودا، کە دوایین بڕگەی فەرمانەکـان بریتی بوو، لە فەرمانکـردن بـە جـەنگ‌و جیهـاد، ئنجـا دەفـەرموێ: ﴿ وَأَتِمُّوا۟ ٱلْحَجَّ وَٱلْعُمْرَةَ لِلَّهِ ﴾، وێـڕای ئـەو کردەوانـەی دیکە کـە هەرکامێکـیان لـەکاتی خۆیـداو لـە هەلـومەرجی ڕەخـساوی خۆیدا ئەنجام دەدرێ، دیـارە زانینـی ئـەو خاڵـە زۆر گرنگە: مـسوڵمانان پێویـستە لەسـەریان جەنگ‌و جیهاد بکـەن کـاتێ هەلومەرجیـان بۆ دەرەخسێ، وە پێویـستە حـەج بکـەن، بـەڵام ئەگـەر هەلـومەرجیـان بـۆ ڕەخـسا، وە لەســەریان پێویـستە زەکـات بـدەن ئەگـەر هەلومـەرجیان بـۆ ڕەخـسا، وە پێویـستە لەسـەریان ڕۆژووی ڕەمەزان بگـرن، بـەڵام کاتێـك ڕەمەزان هـات.

هەلـومەرج ڕەخـسـان زۆر گرنگـە، هەلـومەرج ڕەخـسان، یـانی چـی؟ یـانی: ئـەو هەلــومەرجەی کـاتی خـۆی ڕەخـساوە بـۆ هاتنـە خـوارەوەی ئـەو ئایەتـەی، کـە دەفەرموێ: ﴿ وَقَـٰتِلُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ٱلَّذِينَ يُقَـٰتِلُونَكُمْ ﴾، دەبێـت جارێکی دیکە هـەمان هەلــومەرج بڕەخـسێتەوە، بـۆ هـەر کۆمـەڵێك لـە مـسوڵمانان، ئنجـا ئـەم ئایەتـە تەکلیفـیان لـێ دەکات‌و ڕووی دوانـدن (خطـاب)یـان تێدەکـات، ئەگەرنـا وەنـەبێ تـۆ قورئـان هەمووی بێنـی‌و بڵـێی: ئێـستا دەبـێ هـەمووی جێـبەجێ بکـەم! چۆن دەتوانی هەمـووی جێـبەجێ بکـەی؟! ئەم قورئانە بەتایبەتی لایەنە یاساییەکـەی‌و حوکمــە شــەرعییەکانی هــەر حــوکمێکی شــەرعیی، هەلــومەرجێکی ڕوخــساوو گونجـاوی دەوێ، مـسـوڵمانان کـاتـێ لە توانایانـدا نەبێت جەنـگ‌و جیهاد بکەن، نابێ

بڵێن: هەر دەبێت جەنگ بکەین، چونکە خوا فەرزی کردوە جەنگ و جیهاد بکەی، بەڵام تۆ دەبێت شەڕێك بکەی کە خێری تێدابێ، دەبێ جەنگێك بکەی کە لەسەری قەرزار نەبیەوە، ئنجا دەفەرمویٚ: ﴿ وَأَتِمُّواْ ٱلْحَجَّ وَٱلْعُمْرَةَ لِلَّهِ ﴾، حەج و عومرە بۆ خوا تەواو بکەن، بۆچی فەرموویەتی: بۆ خوا؟ چونکە ئەوان حەج و عومرەیان بۆ بتەکان دەکرد، بۆ ئەوەی لە بتەکان نزیکببنەوە، زۆر شتیان دەکرد بۆ ئەوەی بتەکان شەفاعەتیان بۆ بکەن لە لای خوا، جا خوا دەفەرمویٚ: حەج و عومرە بۆ خوا ئەنجام بدەن، وشەی: ﴿ وَأَتِمُّواْ ﴾، دەگونجێ بەمانای ئەوەبێ هەرکات دەستیان پێکردن تەواویان بکەن و بە نیوەچڵیی بەجێیان نەهێڵن، یاخود مەبەست ئەوەبێ بەتەواوی بیانکەن، ﴿ فَإِنْ أُحْصِرْتُمْ فَمَا ٱسْتَيْسَرَ مِنَ ٱلْهَدْيِ ﴾، جا ئەگەر ڕێتان لێگیرا، ئەوەی کە بەدەستتانەوە دێ و ئاسانە لە قوربانی سەربڕین، سەری ببڕن و ئیحرام بشکێنن، وەك چۆن پێغەمبەر ﷺ لە ساڵی شەشی کۆچی لە صوڵحی حودەیبییەدا وایکرد، دوای ئەوەی کە نەیتوانی بچێ عومرە بکات و کافرەکان ڕێیان لێگرتن، فەرمانی کرد ئیحرام بشکێنن و حەیوانەکانیان سەرببڕن ﴿ وَلَا تَحْلِقُواْ رُءُوسَكُمْ حَتَّىٰ يَبْلُغَ ٱلْهَدْيُ مَحِلَّهُۥ ﴾، وە سەری خۆتان مەتاشن، هەتا قوربانییەکان دەگەنە شوێنی خۆیان، شوێنی خۆیان کوێیە؟ مینایە، دەبێ بگەیە ئەوێ (ئەوە لە حاڵەتی حەجکردن دایە) دوای ئەوە لە عەرەفات و لە موزدەلیفە دەگەڕێنەوە بۆ مینا، ئەوجار ئاژەڵەکانیان سەردەبڕن. ﴿ فَمَن كَانَ مِنكُم مَّرِيضًا أَوْ بِهِۦٓ أَذًى مِّن رَّأْسِهِۦ ﴾، بەڵام کەسێك نەخۆشبوو، یان ئازارێك لەسەریدا هەبووو پێویستی بەوە هەبوو سەری بتاشێ، ﴿ فَفِدْيَةٌ مِّن صِيَامٍ أَوْ صَدَقَةٍ أَوْ نُسُكٍ ﴾، ئەوە با سەری خۆی بتاشێ، بەڵام فیدیەیێك بدات، فیدیەش، واتە: قەرەبوویەك بدات لە: ڕۆژووگرتن، یاخود صەدەقەیەك، یاخود قوربانییەك سەرببڕێ، جا ڕۆژوو گرتنەکە سێ ڕۆژەو، خێرکردنەکە خواردنی شەش هەژارەو، قوربانییەکەش مەڕێکە یان بزنێکە، لەسەر ڕای زۆربەی زانایان.

هەندێکیش دەڵێن: کەمتریش لە مەڕو بزن، واتە: بە دووان مەڕێك، یان بزنێك سەرببڕن دەبێ، بەڵام ڕای زۆربەی زانایان بەهێزترە، کە مەڕێك، یان بزنێکە.

﴿ فَإِذَآ أَمِنتُمۡ فَمَن تَمَتَّعَ بِٱلۡعُمۡرَةِ إِلَى ٱلۡحَجِّ فَمَا ٱسۡتَيۡسَرَ مِنَ ٱلۡهَدۡيِۚ ﴾، جـا ئەگـەر دڵنیابوونەوەو بە ئەمینی چوون حەجتـان کـرد، هەرکەسێك عومرەی بـردە گەڵ حـەج، کە پێی دەگوترێ حـەجی تەمەتتوع، چونکە سێ جۆرە حەجمان هەن، کە بریتیـن لە: (قِـران، إفـراد، تَمَتـع):

(تمتع): ئەوەیە کە حەجو عومرە پێکـەوە بکـەیو کاتێك کە ئیحـرام دەبەستی نیەتی هەردووکیـان بەیەکەوە بێنی، جا دەفەرموێ هەر کەسێك عومرەی بردە لای حـەج، ئـەوە پێویـستە قوربانییـەك سـەربڕێ، ﴿ فَمَن لَّمۡ يَجِدۡ فَصِيَامُ ثَلَٰثَةِ أَيَّامٖ فِي ٱلۡحَجِّ وَسَبۡعَةٍ إِذَا رَجَعۡتُمۡۗ تِلۡكَ عَشَرَةٞ كَامِلَةٞۗ ﴾، هەر کەسێك ئاژەڵێکی دەست نەکـەوت سـەری ببـڕێ، نـەیبوو، ئیمکانیـەتی مـاددیی نـەبوو، ئـەوە پێویـستە لەسـەری سێ ڕۆژان بەڕۆژوو بێت لەوکاتەدا، کە لە حەجێیە، وە حەوت ڕۆژیـش کە گەڕایەوە لە حەج، ئەوە دەبن بە دەی تەواو، ﴿ ذَٰلِكَ لِمَن لَّمۡ يَكُنۡ أَهۡلُهُۥ حَاضِرِي ٱلۡمَسۡجِدِ ٱلۡحَرَامِۚ ﴾، ئەو قـەرەبوو دانـەوەو فیدیـە دانـە، بـۆ کەسـێکە کـە کەسـوکارو مـاڵو منـداڵی لـەلای مزگەوتی حەرام نەبێتو، کەسێك خەڵکی نزیکی لەوێـبێ، فیدیەی ناکەوێتـە سـەر ﴿ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلۡعِقَابِ ﴾، وە پارێز لە خوا بکەنو بزانن کە خـوا سـزای تونـدە، ﴿ ٱلۡحَجُّ أَشۡهُرٞ مَّعۡلُومَٰتٞۚ ﴾، دوای ئـەوەی باسـی پێویـستبوونی ئەنجامدانی حـەجو عومرەی کردو باسی کۆمەڵێك یاسای حەجی کرد، ئنجـا باسـی کـاتی ئەنجامدانی حەج دەکاتو دەفەرموێ: کاتی ئەنجامدانی حەج چەند مـانگێکی دیاریکراوە، کە (ذو العَقِدَة، ذو الحِجَة)ن، وە هەنـدێك (شـوال)یـشی دەخەنـە گەڵ (شَوَال، ذو العَقِدَة، ذو الحِجَة)، واتـە: بۆی هەیـە لـە (شـوال)ەوە ئیحـرام ببەسـتێ، ﴿ فَمَن فَرَضَ فِيهِنَّ ٱلۡحَجَّ فَلَا رَفَثَ وَلَا فُسُوقَ وَلَا جِدَالَ فِي ٱلۡحَجِّۗ ﴾، جـا هـەر

کەسێك حەجی لەومانگەدا لەسەرخۆی پێویست کرد، ئەوە نابێ قسەی بێجێو، گوناهبارییو، شەڕە قسە هەبێ لە حەجدا.

﴿ رَفَثَ ﴾، واتە: قسەی ناشرین قسەی بێجێ بەتایبەت کە باسی لایەنی جینسیی تێدابێت، دیارە ئەگەر قسەی بۆ دروست نەبێت، ئەوە چاکتر دروست نیە دەستبازیی لەگەڵ خێزانیدا بکات، یان ماچی بکات.

﴿ فُسُوقَ ﴾، واتە: هەر شتێك کە ئینسان پێی فاسق دەبێتو لە ڕێ دەردەچێ، (جدال) واتە: شەڕە قسەو دەم بەدەمە، ﴿ وَمَا تَفۡعَلُواْ مِنۡ خَيۡرٖ يَعۡلَمۡهُ ٱللَّهُۗ ﴾، وە هەر چاکەیەك بکەن خوا پێی دەزانێ، دیارە خراپەش بکەن خوا ﷻ هەر پێی دەزانێ، وەك پێشتر ئاماژەی بە سێ جۆری دا، ﴿ وَتَزَوَّدُواْ فَإِنَّ خَيۡرَ ٱلزَّادِ ٱلتَّقۡوَىٰۚ ﴾، وە توێشوو هەڵگرنو باشترین توێشووش پارێزکارییە، بەڵام بەشێك لە پارێزکارییش ئەوەیە کە ئینسان توێشووی خۆی پێبێو نانی خۆی بخواو منەتی خەڵکی هەڵنەگرێ ﴿ وَٱتَّقُونِ يَٰٓأُوْلِي ٱلۡأَلۡبَٰبِ ﴾، وە پارێزم لێبکەن ئەی خاوەن عەقڵان، چۆن پارێز لە خوا دەکرێ؟ چۆن ئینسان خۆی لە سزای خوا دەپارێزێ؟ بێگومان مرۆڤ خۆی لە سزای خوا دەپارێزێ، بەوە کە پابەندبێ بە شەریعەتی خواوە، ﴿ لَيۡسَ عَلَيۡكُمۡ جُنَاحٌ أَن تَبۡتَغُواْ فَضۡلٗا مِّن رَّبِّكُمۡۚ ﴾، گوناهتان ناگات کە لە بەخششی پەروەردگارتان داوا بکەنو، لە حەجێدا بازرگانییو کەسابەت بکەن، هەڵبەتە نابێ مرۆڤ تەنیا بۆ مەبەستی بازرگانیی بچێ، بەڵام ئەگەر لە پەنای حەجێدا سەوداو مامەڵەیەکیش بکات گوناهی ناگاتێ، تەماشا بکەن ئیسلام چۆن حەجو کەسابەت پێکەوەو تەقواو غەزا پێکەوە گرێ دەداتو دنیاو دوارۆژ پێکەوە گرێ دەدات !! ﴿ فَإِذَآ أَفَضۡتُم مِّنۡ عَرَفَٰتٖ فَٱذۡكُرُواْ ٱللَّهَ عِندَ ٱلۡمَشۡعَرِ ٱلۡحَرَامِۖ ﴾، جا ئەگەر لە عەرەفات هاتنە خوار، ڕژانە خوارێ، لەلای مەشعەری حەرام یادی خوا بکەن ﴿ وَٱذۡكُرُوهُ كَمَا هَدَىٰكُمۡ ﴾، وە

یادی بکەن، وەك چۆن ئەو ڕێنمایی ئێوەی کردوە، ﴿وَإِن كُنتُم مِّن قَبْلِهِۦ لَمِنَ ٱلضَّآلِّينَ﴾، هەرچەندە بە تەئکید ئێوە پێش ئەوەی خوا هیدایەتتان بدات گومراو سەرگەردان بوون ﴿ثُمَّ أَفِيضُوا۟ مِنْ حَيْثُ أَفَاضَ ٱلنَّاسُ﴾، دوایی خەڵك لە کوێوە شۆڕدەبنەوە بەرەو موزدەلیفەو مەشعەری حەرام، ئێوەش لەوێوە شۆڕبنەوە، - کە مەبەست پێی قورەیشییەکانە - هەموو دەبێ بچن بۆ عەرەفاتو کەس نابێ خۆی جیابکاتەوەو، هەموو دەبێ لە عەرەفات ڕابوەستنو ئێوارەی عەرەفات یاخود شەوەکەی، شۆڕدەبنەوە بەرەو موزدەلیفەو بەرەو مەشعەری حەرام ﴿وَٱسْتَغْفِرُوا۟ ٱللَّهَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾، داوای لێبوردنیش لە خوا بکەن، بێگومان خوا لێبوردەی بە بەزەیی یە، ﴿فَإِذَا قَضَيْتُم مَّنَٰسِكَكُمْ فَٱذْكُرُوا۟ ٱللَّهَ كَذِكْرِكُمْ ءَابَآءَكُمْ أَوْ أَشَدَّ ذِكْرًا﴾، جا ئەگەر خوا پەرستییەکانی حەجتان ئەنجامداو تەواوکردنو لێبوونەوە، یادی خوا بکەن، وەك چۆن یادی بابو باپیرانو پێشینانتان دەکەن، یاخود زیاترو باشتریش باسو یادی خوا بکەن، ﴿فَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَقُولُ رَبَّنَآ ءَاتِنَا فِى ٱلدُّنْيَا وَمَا لَهُۥ فِى ٱلْءَاخِرَةِ مِنْ خَلَٰقٍ﴾، خەڵك هەیە لە خوا دەپاڕێتەوە دەڵێ: خوایە لە دنیادا چاکەم بە نسیب بکە، بەڵام پشکی لە دواڕۆژدا نیە، واتە: هەر دووعا بۆ دنیای دەکات!

برایەکمان ڕۆژێ دەربارەی یەکێك دەیگوت: فلان کەس کە شەونوێژیش دەکات هەر بۆ دنیای دەپاڕێتەوە، شەونوێژ دەکاتو هەڵدەستێتەوە، بەڵام هەر دووعا بۆ ماڵ و سامان دەکاتو، دەڵێ: خوایە زیاترم پێبدەیو دەوڵەمەنترم بکەی! ﴿وَمِنْهُم مَّن يَقُولُ رَبَّنَآ ءَاتِنَا فِى ٱلدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِى ٱلْءَاخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ﴾، وە کەسانێکیش هەن دەڵێن: پەروەردگارمان! لە دنیادا چاکەمان بدەیەو لە دواڕۆژیشدا چاکەمان بدەیە، وە لە سزاو ئازاری ئاگر بمانپارێزە! ئێمە دوایی باسی چاکەی دنیاو چاکەی دواڕۆژ دەکەین، کە هەموو

ئەو شتانەی بۆ ئینسان چاكن لە دنیاو دواڕۆژدا هەمووی دەگرنەوە، ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمْ نَصِيبٌ مِّمَّا كَسَبُواْۚ وَٱللَّهُ سَرِيعُ ٱلْحِسَابِ ﴾، ئا ئەوانە پشكو بەشیان هەیە لەوەدا كە وەدەستیان هێناوەو كردوویانە، وە بێگومان خوا لێپرسینەوەی خێرایە.

لە كۆتاییدا خوا ﷻ باسی كۆتا ڕۆژەكانی ئەنجامدانی حەجو عومرە دەكاتو دەفەرموێ: ﴿ وَٱذْكُرُواْ ٱللَّهَ فِيٓ أَيَّامٍ مَّعْدُودَٰتٍ ﴾، وە لە چەند ڕۆژێكی كەمدا یادی خوا بكەن، یانی دوای ئەوەی كە خوا پەرستییەكانی حەجتان تەواوكردنو هێناتاننە تەواوكردنێ، یادی خوا بكەن، كە مەبەست پێی ڕۆژەكانی تەشریق (أيام التشريق) (١١ و١٢ و١٣) كە دەبێ سێ جەمرەكانیان تێدا ڕەجم بكرێن، وەك كوردەواریی خۆمان دەڵێن: (شەیتانی گەورەو نێوەنجیو گچكە)، جا خوا دەفەرموێ: لەو چەند ڕۆژەدا یادی خوا بكەن، ﴿ فَمَن تَعَجَّلَ فِي يَوْمَيْنِ فَلَآ إِثْمَ عَلَيْهِ وَمَن تَأَخَّرَ فَلَآ إِثْمَ عَلَيْهِ ﴾، جا هەر كەسێك پەلەی كردو لە دوو ڕۆژاندا جەمرەكانی بەردباران كردو نەیكردە سێ ڕۆژ، ئەوە گوناحی ناگاتێ، وە ئەوەی دواشكەوت هەر زۆر چاكەو خێری زیاتری دەگاتێو ئەویش گوناحی ناگاتێ، ﴿ لِمَنِ ٱتَّقَىٰ ﴾، بۆ كەسێك كە پارێز لە خوا دەكات، یانی: بۆ لە خوا نزیكبوونەوە بمێنێتەوە، نەك بۆ مەبەستێكی دیكە ﴿ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَٱعْلَمُوٓاْ أَنَّكُمْ إِلَيْهِ تُحْشَرُونَ ﴾، وە پارێز لە خوا بكەنو بزانن هەموو بۆ لای وی خڕدەكرێنەوەو كۆدەكرێنەوە، با ئینسان بزانێ كاتێ كە خوا ﷻ كۆی دەكاتەوە، بە چ چاوو ڕوویەكەوەو بە چ پەرێزو بەرهەمو بە چ شتێكەوە دەچێتەوە لای خواو، چی لەدەستدایەو چی لە هەگبەدایە ؟! خوا لەو كەسانەمان بگێڕێ كە بە سەری بەرزو ڕووی سوورەوە دەچنەوە دەرگای بەردەم خوای پەروەردگار... ئامین.

## چەند مەسەلەیەکی گرنگ

**مەسەلەی یەکەم:** ئەوە کە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَأَتِمُّوا۟ ٱلْحَجَّ وَٱلْعُمْرَةَ لِلَّهِ ﴾، واتە: حەج و عومرە بۆ خوا تەواو بکەن، یان بە تەواویی بیانکەن، هەردوو واتاکەی هەیە، ئەم ڕستە قورئانییە ئەوەی لێ وەردەگیرێ، کە وێڕای حەج، بەجێهێنانی عومرەش فەڕزە، کە ئەوە ڕای ژمارەیەك لە زانایانەو پێشموایە ئەم ڕایە بەهێزترە، چونکە خوا ﷻ هەرچەندە لە شوێنەکانی دیکە تەنیا باسی حەجی کردوە، بەڵام لێرەدا حەج و عومرەی بەیەکەوە باسکردوون و، بەیەکەوەش فەرمانی کردوە بە ئێمەی ئیماندار کە بەتەواویی جێبەجێیان بکەین یاخود تەواویان بکەین، هەڵبەتە ئەوانەش کە دەڵێن: عومرە فەرز نیە، دەڵێن: خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ وَأَتِمُّوا۟ ٱلْحَجَّ وَٱلْعُمْرَةَ لِلَّهِ ﴾، واتە: کاتێك دەستتان پێکردن تەواویان بکەن، جا دیارە سوننەتیش ئەگەر دەستت پێکرد هەر پێویستە تەواوی بکەی، کەواتە: ئەوە بەڵگە نیە لەسەر ئەوەی کە عومرە پێویستە، بەڵکو بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە عومرە پێویستە، ئەگەر دەستت پێکردو چوویە نێوی تەواوی بکەی و نەیپچڕێنی، بەڵام بەهەرحاڵ زیاتر ئەو ڕایە بەهێزتر دێتە بەرچاو کە حەج و عومرە هەردووکیان پێویست بن و دیارە پێغەمبەری خواش ﷺ پێکەوە ئەنجامی داون.

**مەسەلەی دووەم:** ئەوە کە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَأَتِمُّوا۟ ٱلْحَجَّ وَٱلْعُمْرَةَ لِلَّهِ ﴾، ئەم وشەی: ﴿ لِلَّهِ ﴾، واتە: بۆ خوا تەواویان بکەن، بۆیەش وا دەفەرموێ، چونکە لە سەردەمی نەفامییدا عەرەبە بتپەرستەکان هەندێ لە خواپەرستییەکانیان بۆ بت و صەنەمەکانیان ئەنجام دەدا، بەتایبەت هەندێ لە مەناسیکەکانی حەج و عومرەیان بۆ ڕازیکردنی بت و صەنەمەکانیان ئەنجام دەدا، تاکو بەوهۆیەوە بت و صەنەمەکان شەفاعەتیان بۆ بکەن لە لای خوا، بۆیە خوا ﷻ دەفەرموێ: حەج و عومرە بۆ خوا بەتەواویی جێبەجێ بکەن، یاخود بۆخوا تەواو بکەن،

نەك بۆ کەس و شتێکی دیکە، وە ئەوەشی لێ وەردەگیرێ کە حەج و عومرەش وەك هەر خوا پەرستییەکی دیکەو هەر طاعەتێکی دیکە، دەبێ ئینسان لەخۆی وریابێ لە کاتێکدا پێی هەڵدەستێ، دڵی خۆی ساغ و یەکلابکاتەوە هیچ هاندەرو پاڵنەرێکی نەبێ بۆ ئەنجامدانی ئەو طاعەت و چاکەیە، جگە لە رازیکردنی خوای پەروەردگارو وەدەستهێنانی ڕەزامەندیی وی، دیارە حەج و عومرەش مەزەندەنەی ئەوەیان لێدەکرێ هەیە کە ئینسان تێیاندا تووشی غەیری خوا پێ مەبەست بوون، ببێ، بۆ نموونە: کابرا دەچێ بۆ حەج، بەڵام هاندەرو پاڵنەرەکەی بریتیە لە بازرگانیی، هەندێ کەس زۆر دەچی بۆ حەج و هەموو ساڵێکیش دەچێ بازرگانییەکی زۆر دەکات ! بەڵام خوا ﷻ فەرمانی کردوە کە حەج و عومرە تەنیا بۆ خوا ئەنجام بدەن، بەڵێ: کەسابەت و بازرگانیی کردن قەدەغە نیەو، لەگەڵ حەجیشدا قەدەغە نیە ئینسان بازرگانیی بکات، بەڵام دەبێ تەنیا مەبەستەکەت بەجێهێنانی حەج وعومرە بێ، جا لە پەنا ئەوەشدا ئەگەر کەسابەت و بازرگانیی بکەی قەیناکات، نەك مەبەستە ئەسڵییەکەت بازرگانیی کردن و کەسابەت بێ و لە پەنای بازرگانییەکەدا بە ڕواڵەت حەج و عومرە بکەی، ئەوە بە تەئکید زۆر شتێکی خراپەو خراپترین شت ئەوەیە کە ئینسان خوا پەرستییەك کە دەبێ پێی لە خوا نزیك ببێتەوە، وەك شتێکی لاوەکیی ئەنجامی بدات و مەبەستە سەرەکییەکەی شتێکی دیکە بێ، ئەوە بەڕاستی شتێکی زۆر خراپە.

**__مەسەلەی سێیەم:__** ئەو وشە قورئانییەی، کە دەفەرموێ: ﴿ فَإِنْ أُحْصِرْتُمْ ﴾، پێشتر باسمانکرد کە وشەی (إحصار) هەیەو وشەی (حصر)یش هەیەو هەردووکیان بەمانای ڕێ لێگیرانن، جا زانایان و شەرعزانان دەڵێن: (إحصار) ئەوەیە کە بەهۆی هۆکارێکی ڕواڵەتیی یان پەنهانیی ڕێت لێبگیرێ لە چوونە حەج، بۆ نموونە: دوژمنێك هەبێت، یان مەترسیی لە ڕێگادا هەبێت، شتێکی ئاشکرا بێ یاخود پەنهان، بەڵام (حصر) ئەوەیە کە بەهۆی شتێکی پەنهانەوە ڕێی چوونە حەجت نەبێ، دیارە پێشتر باسمان کرد ئەگەر ئینسان ئیحرامی بە

حەج یان عومرە بەستو دوایی ڕێی لێگیرا، دەبێ ئیحرامەکەی هەر لەو شوێنەدا بشکێنێ، بەڵام ئەو عیبادەتەی دەکەوێتە سەرو دەبێ ساڵێکی دیکە یان کاتێکی دیکە دووبارە ئیحرام بەو عیبادەتە ببەستێتەوە، حەج یان عومرەو ئەنجامی بدات، وەك چۆن پێغەمبەر ﷺ لە ساڵی شەشەمی کۆچیدا کە صوڵحی حودەیبییەی تێدا واقیع بوو ئیحرامیان بە عومرە بەستبوو ئەوەبوو کە ڕێیان لێگیرا دوایی ساڵی حەوتەم عومرەکەیان گێڕایەوە ئەو ساڵەیان ناولێنا (عامُ عُمرَةِ القَضَاء) واتە: ساڵی عومرەی گێڕدراوە[1].

**مەسەلەی چوارەم:** ئەوەیە کە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿وَلَا تَحْلِقُوا رُءُوسَكُمْ حَتَّى يَبْلُغَ الْهَدْيُ مَحِلَّهُ﴾، وە سەری خۆتان مەتاشن تاکو قوربانییەکان دەگەنە شوێنی خۆیان، زانایان هەموو لەسەر ئەوە یەك دەنگن کە شوێنی خۆیان و کاتی سەربڕینی قوربانییەکان بریتیە لە ڕۆژی دەیەمی (ذي الحِجّة) و شوێنەکەشی بریتیە لە مینا، واتە: پێویستە قوربانیی لە ڕۆژی دەیەمی (ذي الحِجّة) و لە مینادا سەر ببڕدرێن.

**مەسەلەی پێنجەم:** ئەو ڕستە قورئانییەی، کە دەفەرموێ: ﴿فَمَا اسْتَيْسَرَ مِنَ الْهَدْيِ﴾، باسمان کرد کە (هَدي) کۆی (هَدية)یە، هەدیەش ئەو ئاژەڵەیە کە بابای حاجی یا عومرەکەر لەگەڵ خۆی دەیبا، بۆ ئەوەی لەوێ سەری ببڕێ، بیکات بە قوربانیی، جا کە دەفەرموێ: ﴿فَمَا اسْتَيْسَرَ مِنَ الْهَدْيِ﴾، واتە: ئەوەی کە بەدەستتانەوە دێ و بۆتان ئاسانە لە قوربانیی، کاتێك کە ئینسان ناچار دەبێت سەری خۆی بتاشێ، یان کورتی بکاتەوە لەبەر ئەوەی ئازارێکی لەسەری دا هەیە، یان لەبەر هەر هۆیەك بێ، یان بۆ وێنە: نینۆکی بکات، یان شتێك بکات کە لە دوای ئیحرام بەستنەوە لێی قەدەغەیە، ئەوە خوێنی

---

1) بڕوانە: (السيرة النبوية) لإبن هشام، ج: (٣)، ص: (١٦٢-١٦٣)، کە باسی صوڵحی حودەیبییەی تێداکراوەو، ج: (٢)، ص: (٢٠٧-٢٠٨) کە باسی (عمرة القضاء) ی تێداکراوە.

دەکەوێتە سەر، جا زۆربەی زانایان دەڵێن: ﴿ فَمَا ٱسْتَيْسَرَ مِنَ ٱلْهَدْيِ ﴾، ئەوەی کە ئاسانە لە قوربانیی، مەبەست پێی مەڕێکە یان بزنێکە، دیارە ئەگەر حوشتر، یان مانگاش بێ، ئەوە باشتر، بەڵکو حوشترو مانگا بە کەڵکی حەوت نەفەران دێن، بەڵام هەندێ لە زانایان دەڵێن: ﴿ فَمَا ٱسْتَيْسَرَ مِنَ ٱلْهَدْيِ ﴾، ئەوەی لێوەردەگیرێ کە مەرج نیە مەڕێکی تەواو، یان بزنێکی تەواو بێت، بەڵکو ئەگەر لەجیاتی مەڕێك بەرخۆڵەیەکیش بێت، وە لەجیاتی بزنێ کاریلەیەکیش بێ، یاخود بە دوو نەفەران مەڕێك، یان بزنێك بێ، ئەوەش هەر بەکەڵك دێ، بەڵام زۆربەی زانایان دەڵێن: نەخێر دەبێ مەڕێکی تەواو یاخود بزنێکی تەواوبێ ئەوجار قوربانیی دەشێ‌و، ڕای زۆرینەش بەهێزترە.

**مەسەلەی شەشەم:** ئەم ڕستەیەی دەفەرموێ: ﴿ فَمَن كَانَ مِنكُم مَّرِيضًا أَوْ بِهِۦٓ أَذًى مِّن رَّأْسِهِۦ فَفِدْيَةٌ مِّن صِيَامٍ أَوْ صَدَقَةٍ أَوْ نُسُكٍ ﴾، هەر کەسێك نەخۆشبوو، ناچار بوو خۆی بشوات، یان ناچاربوو بە هۆی هەبوونی ئازارێکەوە خۆی چارەسەر بکات، یان ناچاربوو خۆی بۆن خۆش بکات، وە ناچار بوو بەشێك لە ئیحرام بشکێنێ، دەبێ فیدیە بدات، کە یەکێکە لە سێ شتان: ڕۆژووگرتن، صەدەقەو خێر، سەربڕین. وەك لە فەرمایشتێکدا کە پێشتر هێنامان - لە هۆی هاتنە خوارەوەدا - کە بوخاریی‌و موسلیم دەیگێڕنەوە هاتوە: کە یەکێك لە هاوەڵانی بەڕێز دەچێتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ کە سەری زۆر دژوێن دەبێ‌و ئەسپێی زۆری لەسەردا دەبێ، ئەویش دەفەرموێ: ئەو زیندەوەرانەی سەرت ئازارات نادەن ؟ دەڵێ: بەڵێ، دەفەرموێ: سەرت بتاشەو یەکێ لە سێ شتان بکە: (صُمْ ثَلاثَةَ أَيَّامٍ أَوْ تَصَدَّقْ بِفَرَقٍ بَيْنَ سِتَّةِ مَسَاكِينَ أَوِ انْسُكْ مَا تَيَسر)، یان سێ ڕۆژان بەڕۆژووبە، یاخود خواردنی شەش هەژاران بدە (یەکی ژەمێك)، یاخود ئاژەڵێك سەربڕە، واتە: سەرپشك دەکرێ لەنێوان هەڵبژاردنی یەکێ لەو سێیانەدا، هەروەها هەر جۆرە خەلەلێکی دیکەش لەو بابەتانە کە دێتە پێش، لە هەموو ئەو حاڵەتانەدا، دەبێ فیدیە بدا، کە ئەویش یەکێ لەو سێ شتانەیە: سێ

ڕۆژ بەڕۆژوو بێ، یان خواردنی شەش هەژار بدات یەکێ ژەمێك، یاخود ئاژەڵێك سەرببڕێ، ئەوە زۆربەی زانایان ئەگەر نەڵێین: هەموویان لەسەری یەکدەنگن.

**مەسەلەی حەوتەم:** دەربارەی ئەم ڕستەیەی، کە دەفەرموێ: ﴿فَمَن تَمَتَّعَ بِٱلۡعُمۡرَةِ إِلَى ٱلۡحَجِّ﴾، هەر کەسێك تەمەتتوعی کردو عومرەی بردە نێو حەجێ، حەج سێ جۆری هەیە:

١- (حَـج التَمَتُّـع)، ٢- (حَـج الإفـراد)، ٣- (حَـج القِـران).

١) **حەجی تەمەتتوع (حَج التَّمَتُّع):** ئەو حەجەیە کە پیاوێك یان ئافرەتێك بیەوێ حەج بکات، کە ئیحرام دەبەستێ لە میقات بڵێ: (لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ عُمْرَةً) یەکسەر ئیحرام بە عومرە دەبەستێ، واتە: نیەتی عومرە دێنێو پایەو فەرزەکانی تەواو دەکاتن پایەکانی عومرەش بریتین لە: ئیحرام بەستنو، طەوافی دەوری کەعبەو هاتووچۆی نێوان صەفاو مەروە، وە دوایی سەری کورت بکاتەوە یاخود بیتاشێ، هەرکات ئەو چوار ئەرکەی ئەنجامدان عومرەکەی تەواو دەبێت، عومرە ئەو چوار ڕوکنەی هەن، یاخود ئەو چوار واجبەی هەن، لەسەر ڕای هەندێك لە زانایان کە ناویان نانێن ڕوکن، جا دوای ئەوەی کە عومرەی تەواوکرد بۆی هەیە ئیحرام بشکێنێو ئیحرام بە حەج ببەستێتەوە، لەو شوێنەی کە لێیەتی لە مەککە، وە لەسەر ئەوە خوێنی دەکەوێتە سەرو دەبێ ئاژەڵێك سەرببڕێ، ئا ئەوە حەجی تەمەتتوع (حَجُّ التَمَتُّع)ی پێدەگوترێ.

٢) **حەجی ئیفراد (حَج الإفرَاد):** ئەوەیە کە کاتێك مرۆڤ ئیحرام دەبەستێ، یەکسەر بڵێ: (لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ حَجًّا) ئیحرام بە حەج ببەستێو کە حەجی تەواوکرد، ئنجا دووبارە ئیحرام بە عومرە دەبەستێتەوە، وە ئەم جۆرە حەجە، خوێنی ناکەوێتە سەرو لەسەری پێویست نابێ ئاژەڵێك سەرببڕێ، چونکە دوو ئیحرامی بەستوون بۆ دوو خواپەرستییو هەردووکیان لە میقات.

٣) **حەجی قیـڕان (حَجُّ القِران)**: ئەوەیـە کـە کاتێـك ئیحـڕام دەبەسـتێ نیـەت بێنـێو بڵـێ: (لَبَّیْكَ عُمْرَةً وَحَجًّا) (رَوَاهُ مُسلم برقم: (٣٠١٩)، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رضي الله عنه) خوایـە لـە خزمـەت دام حـەجو عـومرە بەیەکـەوە دەکـەم، (قیـڕان)یـش واتـە: جووتکـردن، وەك چـۆن (إفراد) واتـە: تاککـردن، ئەگـەر حـەج تـاك بکـاتەوەو جیابکـاتەوە پێـی دەگـوترێ: (إفـراد)، وە ئەگـەر پێکەوەیـان بکـا، پێـی دەگوترێ: (قِران) حـەجی قیـڕانیش ئەوەیـە کـە نیـەتی حـەجو عومرە پێکـەوە بێنـێو ئیحـڕام نەشکێنـێ، تـاکو هەردووکیـان ئەنجـام دەدا، کە ئـەویش خـوێنی دەکەوێتـە سـەر، واتـە: حـەجی تەمـەتتوعو حـەجی قیـڕان، هـەردووکیان ئـەو کەسـە لەسـەری پێویـست دەبـێ دوایـی ئاژەڵێـك سەرببڕێ، بەڵام حـەجی (إفراد) ئـاژەڵ سـەربڕینی ناوێ، چـونکە بـۆ هەرکـام لە حـەجو عومرە، دەچـێ لە میقات ئیحـڕام دەبەستێتەوە.

**مەسـەلەی هەشـتەم**: دەربارەی ئەو ڕسـتەیەی، کـە دەفـەرموێ: ﴿ذَٰلِكَ لِمَن لَّمْ يَكُنْ أَهْلُهُۥ حَاضِرِي ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ﴾، دەڵێن: حەجی تەمەتتـوع ئەوەیـە مرۆڤ کـە حـەج دەکـات، پێـشێ ئیحـڕام بـە عـومرە دەبەسـتێو کـە عـومرەی تـەواوکرد، ئیحـڕامەکە دەشـکێنـێ، بۆ وێنە: یەکێك مانگێـك پێشتـر چووە بۆ حەج، ئەگـەر مـاوەی مانگـێك ئیحڕامەکـەی هـەر پێوەبـێ، زۆر سـەغـڵەت دەبـێ، بـەڵام کـە عومرەکـەی کرد ئیحڕامەکـەی دەشـکێنێ، بۆیە پێـی دەگـوترێ: تەمـەتتوع کـە بەمانای ڕابواردنو خۆشـحاڵیی دێ، چونکە کە ئیحڕامی پێوە بێ، بۆی نیە بۆنی خۆش بەکـاربێنێو نینـۆك بکاتو خۆی بشواتو موو لـەخۆی بکاتـەوە ئەوانـەی بۆنیە، بەڵام هەموو کەس کە ئەو جۆرە حەجە دەکـات خـوێنی ناکەوێتـە سـەر، وەك خوا فەرموویەتی: ﴿ذَٰلِكَ لِمَن لَّمْ يَكُنْ أَهْلُهُۥ حَاضِرِي ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ﴾، ئـا ئەوە بۆ کەسێکە کە ماڵی، یاخود کـەسوکاری ئامادەی مزگەوتی حـەرام نـەبێت، زانایان سـێ واتایـان لەم ڕسـتەیە داوەتەوە:

١/ خەڵکی شاری مەککە نەبێت.

٢/ خەڵکی سنووری حەرەم نەبێ.

٣/ خەڵکی ئەولای میقات نەبێت، واتە: خەڵکی ئەو شوێنە نەبێت کە دەکەوێتە نێوان یەکێك لە میقاتەکانو مەککە، چونکە هەرکەسێك کە دەچێ بۆ حەج یان بۆ عومرە، دەبێ پێش ئەوەی بگاتە میقات ئیحرام ببەستێو بە ئیحرامەوە نەبێت دروست نیە بچێتە سەر زەمینی حەرەمەوە، دیارە میقاتەکانیش هەموویان دیاریکراون: میقاتی خەڵکی عیراق (ذاتُ عِرق)ی پێ دەڵێنو، هی مەدینە (آبار علي) پێ دەڵێنو هی یەمەن (یلم لم)ی پێ دەڵێن ...هتد، جا ئەو میقاتانە هەیانە سەد کیلۆمەترو هەیە زیاترو هەیە کەمتر لە مەککەوە دوورە، واتە: بە ماوەی سەد کیلۆمەتر زیاتر بەر لەوەی بچێتە نزیك مەککە دەبێ ئیحرام ببەستێ، کە ئەوە بۆ کەسێکە خەڵکی ئەوێ نەبێ، بەڵام ئەدی ئەوەی خەڵکی سنووری حەرەم بێت؟ ئەوە خوێنی ناکەوێتە سەرو بۆی هەیە ئیحرام بە عومرە ببەستێو دواییش هەر لەوێ، ئیحرام بە حەج دەبەستێ.

**مەسەلەی نۆیەم:** ﴿ ٱلْحَجُّ أَشْهُرٌ مَّعْلُومَٰتٌ ﴾، دیارە لێرەدا وشەیەك پەرێنراوە کە سیاق دەلالەتی لەسەر دەکاتو بە عەقڵ دیارە، ئەویش بریتیە لە: (وَقْت) واتە: (وَقْتُ ٱلْحَجِّ أَشْهُرٌ مَّعْلُومَٰتٌ)، کاتی حەج ئەو کاتانەی حەجیان تێدا ئەنجام دەدرێ، چەند مانگانێکی دیاریکراون، بە پێچەوانەی عومرەوە، عومرە هەموو کاتەکانی ساڵ جێبەجێ دەکرێو هەر وەختێك بچی بۆ عومرە دەبێ، بەڵام حەج تەنیا لە سێ مانگی دیاریکراودا دەکرێ: (شَوَّال، ذو العقدة، و ذو الحجة)، واتە: لەو سێ مانگەدا نەبێ دروست نیە ئیحرام بە حەج ببەسترێ، بۆ وێنە: کەسێك بۆی نیە لە مانگی شەعباندا بڵێ: ئیحرامم بە حەج بەستوە، یان بڵێ: ئیحرامم بە عومرە بەستوە، بەڵام دەیبەمە لای حەج، ئەوە نابێ! دەبێ تەنیا لەو سێ مانگەدا کە دیاریکراون ئیحرام بە حەج ببەستێ.

**مەسەلەی دەیەم:** مانای ئەو ڕستە قورئانییەی، کە دەفەرموێ: ﴿ فَمَن فَرَضَ فِيهِنَّ ٱلۡحَجَّ ﴾، واتە: (فَمَنْ أَوْجَبَ عَلَى نَفْسِهِ فِيهِنَّ الحَجَّ) واتە: هەرکەسێك حەجی لەسەر خۆی پێویست کرد، لەو مانگە دیاریکراوانەدا کە مەبەست پێی دەستپێکردنی حەجە، چونکە خواپەرستیی یەکان فەرز بن یان سوننەت، کە دەستیان پێکرا پێویستە تەواوبکرێن‌و بە نیوەچڵیی بەجێنەهێڵرێن.

**مەسەلەی یازدەیەم:** دەربارەی ئەو ڕستەیە، کە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ لَيۡسَ عَلَيۡكُمۡ جُنَاحٌ أَن تَبۡتَغُواْ فَضۡلٗا مِّن رَّبِّكُمۡ ﴾، گوناهتان ناگاتێ لەکاتی حەجدا لە بەخششی پەروەردگارتان داوا بکەن، واتە: بازرگانیی‌و کەسابەت بکەن، ئەمە ئەوەی لێوەردەگیرێ کە ئیسلام حەساسیەتی بە ماڵ‌و سامان‌و کەسابەت‌و بازرگانیی‌و دەوڵەمەندیی نیە، نەك هەر حەساسیەتی پێ نیە بەڵکو پێی خۆشە مسوڵمان دەست بجووڵێنی‌و هەبووبێ، وە ئیسلام حەز ناکات کە مسوڵمانان چاو لە دەستی خەڵکی بکەن، بۆیە تەنانەت لەکاتی حەجیشدا بۆیان هەیە کەسابەت بکەن، بەڵام وەك گوتم: نابێ مرۆڤ ئامانجی کەسابەتکردن بێ لە چوونە حەجدا، ئنجا خوای کاربەجێ ناوی لەو کەسابەت‌و لەو ڕزق‌و ڕۆزییە ناوە کە لە ڕێی بازرگانیی‌و مامەڵەوە پەیدادەبێ، بەخشش (فضل)، ﴿ لَيۡسَ عَلَيۡكُمۡ جُنَاحٌ أَن تَبۡتَغُواْ فَضۡلٗا مِّن رَّبِّكُمۡ ﴾، گوناهتان ناگاتێ لەکاتی حەجدا لە بەخششی پەروەردگارتان داوا بکەن، کەواتە: نەك هەر حەڵاڵ و زەلاڵ بەڵکو شتێکی پەسندو باشیشە.

**مەسەلەی دوازدەیەم:** دەربارەی ئەو ڕستەیە، کە دەفەرموێ: ﴿ فَإِذَآ أَفَضۡتُم مِّنۡ عَرَفَٰتٖ ﴾، هەرکاتێ ڕژانە خوار لە عەرەفات، بۆیە دەفەرموێ: ڕژانە خوار، چونکە هەر کەسێك حەج بکات‌و دیمەنی هاتنە خواری حاجیان لە عەرەفات کە شوێنێکی بەرزە، دەشتاییەکی بەرزە بەرەو موزدەلیفە تەماشا بکات، دەبینێ لافاوێك، بەحرێك چۆن دەڕژێتە خوار ئاوا ئەو دیمەنەی دێتە پێش چاو، واتە کاتێك کە ڕژانە خوار لە عەرەفاتەوە بەرەو موزدەلیفە، کە بە

پلەی یەکەم مەبەستی پێ قوڕەیشییەکانە کە دەیانگوت: ئێمە نابێ خۆمان لەگەڵ خەڵکی دیکە تێکەڵ بکەین خۆیان پێ لە خەڵکی دیکە بەرزتر بوو، بۆیە دەیانگوت: ئێمە هەر هەتا موزدەلیفە دەچین‌و ناگەینە عەرەفات، خەڵکی دیکە بابگەنە عەرەفات، بەڵام ئێمە وەك قوڕەیش بەرزترین لەوان، بەڵام خوای دادگەرو کاربەجێ دەفەرموێ: ﴿ ثُمَّ أَفِيضُواْ مِنْ حَيْثُ أَفَاضَ ٱلنَّاسُ ﴾، دوایی لەو شوێنە دابەزنە خوارێ، داوەرنە خوارێ کە خەڵك لێی دێنە خوارێ، واتە: هەمووتان پێکەوە وەرنە خوار، جا ئەمە ئەوەی لێوەردەگیرێ کە لە خواپەرستییدا، لە ڕوانگەی ئیسلامەوە چینایەتیی نیە، بۆیەش لە ڕیزی نوێژێدا کەس بۆی نیە بڵێ: ئێرەم بۆخۆم دیاریکردوەو هەر دەبێ هەر لێرەبم، جاری وا هەیە پیرەمێردێك، حاجییەك، پیاوێکی بە تەمەن، شوێنێك دیاری دەکات، ئەگەر گەنجێك لە پێشیدا چوو بۆ ئەوێ دەڵێ: کاکە ئێرە شوێنی منە... ! بەڵام لە ئیسلامدا ڕیزبەندیی نیەو کێ دەستپێشخەریی بکات بۆ پێشەوەو، کێ ئازاتر بێت پاداشتی زیاترە، ئیدی ئەوە نیە بڵێی فلان کەس بەرپرسە، یان دەوڵەمەندە، یان بە تەمەنترە، یان چاکترە ...! بەڵێ ئەگەر گەنجێك ڕێز لە بە تەمەنێك بگرێ جێی خۆیەتی‌و، ئەگەر کەسێك ڕێز لە یەکێك بگرێ لەبەر هەر هۆیەك بێت، بۆ وێنە: نەخۆشە، یان بەرپرسێکە، یان زانایەکە، ئەوە بۆخۆی هی خۆیەتی‌و دەتوانێ شوێنی خۆی بداتێ، بەڵام ئەو بۆی نیە بڵێ: لەبەر ئەوەی من بە تەمەنترم یان بەرپرسم، یان لەبەر ئەوەی دەوڵەمەندم، یان چیم، ئەوە شوێنی منە، شتی وا لە ئیسلامدا نیە، ئەو ڕستە قورئانییە ئەوەی لێوەردەگیرێ، بۆیەش پەروەردگار ئامۆژگاری قوڕەیشییەکانی کرد پێی فەرموون: ﴿ ثُمَّ أَفِيضُواْ مِنْ حَيْثُ أَفَاضَ ٱلنَّاسُ ﴾، خۆتان لە خەڵکی جیامەکەنەوە لە بەرانبەر خواداو خەڵك هەمووی وەك یەکە.

**مەسەلەی سێزدەیەم:** ئنجا دەربارەی ئەم وردەکارییانە، کە بۆچی خوای پەروەردگار باسی وردەکاریی خوا پەرستییەکانی حەجمان بۆ دەکات؟ ئەوەی لێوەردەگیرێت کە ئێمە بۆ ئەنجامدانی خواپەرستییەکان، وێڕای قورئان

پێویستیمان بە سوننەتی پێغەمبەر ﷺو پێویستیمان بە (فقـە)یش، واتـە: ڕاو بۆچوونی شەرعزانایانیش هەیە، بۆچی؟ چونکە جاریّ بەبیّ سوننەت زۆرجاران لە قورئان تێناگەین، بەتایبەت شتە کردەییەکان، بۆ وێنە: خوا ﷻ دەفەرمویّ حەج بکەن، بەڵام وردەکارییەکانی هەموو باس نەکردوە بۆیە پیغەمبەر ﷺ بەکردەوە فەرموویەتی: {(خُذُوا عَنِّي مَنَاسِكَكُمْ) (رَوَاهُ مُسْلِمٌ برقم: (٣١٢٤)، وَالنَّسَائِيُّ برقم: (٣٠٦٢)، وأبو داود برقم: (١٩٧٠)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٣٠٢٣)، وغيرهم عَنْ جَابِرِ بْنِ عبدِالله ﷺ) یان (لِتَأْخُذُوا مَنَاسِكَكُمْ) (وَاللَّفْظُ لمُسلم برقم: (٣١٢٤)}، واتە: خوا پەرستییەکانم لێوەربگرن و لێم فێربن و وەك من حەج بکەن، وە هەندیّ جار هەندێك وردەکاریی هەیە، پێویستی بە ڕای شەرعزانانیش هەیە، بەڵام بێگومان هەرکام لە قورئان و سوننەت و شەرع (فقـە) هەر کامێکیان لە پلەی خۆیدایە.

**مەسەلەی چوارەم**: ئەو ڕستەیە، کە دەفەرمویّ: ﴿ فَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَقُولُ رَبَّنَآ ءَاتِنَا فِى ٱلدُّنْيَا وَمَا لَهُۥ فِى ٱلْءَاخِرَةِ مِنْ خَلَٰقٍ ﴾، خوا ﷻ دوو جۆرە ئینسانمان بۆ بە وێنە دێنێتەوە، یەکێکیان تەنیا داوای دنیا لە خوا دەکات، وەك فەرموویەتی: لە خەڵکی کەسانێك هەن دەپاڕێنەوە دەڵێن: پەروەردگارمان لە دنیا پێمان بدە، بەڵام لە دوارۆژدا هیچ پشك و بەشی نیە، کە دیارە هەر سیاقەکەو شێوە تەعبیرەکە ئەوە دەگەیەنیّ، کە ئەو جۆرە کەسە بەلای خواوە پەسند نیە، ئەگەر مسوڵمانیش بیّ، مسوڵمان نابیّ هەر داوای دنیا بکات، ﴿ وَمِنْهُم مَّن يَقُولُ رَبَّنَآ ءَاتِنَا فِى ٱلدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِى ٱلْءَاخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ ﴾، وە لە خەڵکی کەسی وا هەیە، داوای چاکە دەکات لە خوا بۆ دنیاو دوارۆژو دەڵێ: پەروەردگارمان ! لە دنیادا چاکەمان بدەیە وە لە دوارۆژیشدا چاکەمان بدەیە.

یەکێك بۆی هەیە بپرسیّ: باشە بۆچی لێرەدا خوا ﷻ چاکەی دنیای پێش چاکەی دوارۆژ خستوە، خۆ دوارۆژ لە پێش دنیاوەیەو دنیا تەنیا وەسیلەیەکە

بۆ دوارۆژ ؟ وەڵامەکەی ئەوەیە کە دنیا لە ڕووی ڕێزبەندیی زەمەنییەوە لە پێش قیامەتیەوە، تۆ تا لە دنیا چاکە وەدەستنەهێنی، لە قیامەتێ بۆت وەدەستنایەت، وەدەستهێنانی چاکەی قیامەت پەکی لەسەر وەدەستهێنانی چاکەی دنیا کەوتووە، ئەگەر لە دنیادا مرۆڤ ئیمانی نەبێتو طاعەتێکی نەبێتو چاکەی نەبێتو چاکەکار نەبێتو لە دنیا شتێکی نەچاندبێت، لە قیامەتێ چی بدرویتەوە ! ئەگەرنا، ئەوە ناگەیەنێ کە دنیا پێش قیامەتێیە ! نەخێر، بەڵام ئاشکرایە کە ئێمە لەمیانەی دنیاوە بەرەو قیامەتێ دەچینو لەڕاستیدا کەسێك لە چاکەو خێری دنیا بێبەش بێت، لە هی قیامەتیش بێبەش دەبێت ! ئنجا ئایا مەبەست لە (حسنة)ی دنیاو (حسنة)ی دوارۆژ چییە؟ کە خوا فەرموویەتی: ﴿ رَبَّنَآ ءَاتِنَا فِى ٱلدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِى ٱلْـَٔاخِرَةِ حَسَنَةً ﴾، توێژەرەوانی قورئان زۆر شتیان گوتوە، بەڵام خوا ﷻ بە وشەیەك هێناویەتیو هەموو شتەکان دەگرێتەوە:

هەندێکیان گوتوویانە: مەبەست لە چاکەی دنیا لەشی ساغە، وە هەندێك گوتوویانە: دەوڵەمەندییە، وە هەندێك گوتوویانە: ئەوەیە کە مرۆڤ خزمو عەشیرەتی هەبێ، وە هەندێك گوتوویانە: ئەوەیە کە سومعەو ناوی کۆمەڵایەتیی باشی هەبێ، وە هەندێکیان گوتوویانە: مەبەست لە وشەی: (حسنة) کارو کەسابەتی باشە، وە هەندێکیان گوتوویانە: وەچەو منداڵی صالحو هاوسەری باشە، وە هەندێکیان گوتوویانە: خانووو جێگاو ڕێگای باشو فراوانە... هتد، کە لەڕاستیدا ئەوانە هیچیان پێکەوە لەگەڵ یەکدی ناکۆك نینو وشەی (حسنة) هەموو ئەوانە دەگرێتەوە، بەڵام لە پێش هەموو ئەوانەدا (حسنة) بریتییە لە ئیمانو بریتییە لە طاعەتو بریتییە لە بەندایەتیی چاك بۆ خوا، چونکە ئەگەر ئینسان ئەو نیعمەتە گەورەیەی بوو لە نیعمەتەکانی دیکەشی بەهرەمەند دەبێ، هەرچییەك بن: زانستە، دەستەڵاتە، ماڵو سامانە، سومعەیە...هتد، بەڵام هەرکات مرۆڤ لە نیعمەتی ئیمان بێبەش بوو، ئەوە نیعمەتەکانی دیکەشی هەموو لێ دەبنە بەڵا،

سەروەت‌و سامانە پێی لە خوا یاخی دەبێ، دەستەڵاتە پێی لەخۆبایی دەبێت، هەرچی نیعمەتە ئەگەر ئیمانی لەگەڵدا نەبوو، ئینسان لەسەری قەرزار دەبێتەوە، دیارە چاکەی دوارۆژیش بریتیە لە ڕەزامەندیی خواو بەهەشت.

**مەسەلەی پازدەیەم:** خوا ﷻ کە دەفەرموێ: ﴿ وَٱذْكُرُواْ ٱللَّهَ فِىٓ أَيَّامٍ مَّعْدُودَٰتٍ ﴾، یادی خوا بکەنەوە لەچەند ڕۆژێکی ژمێردراودا، واتە: چەند ڕۆژێکی کەمن، لەبەر کەمیی دەژمێردرێن، کە وەك پێشتر باسمان کرد مەبەست پێی ڕۆژەکانی تەشریقە (أیام التشریق) (١١و ١٢و ١٣)ی مانگی (ذي الحجة)، کە یادی خوایان تێدا بکەین، چۆن یادی خوا بکەین؟ شەرعزانان زۆریان باسکردوە، بەڵام هیچ شتێك لەلایەنی پێغەمبەرەوە ﷺ دیاری نەکراوە کە حەتمەن دەبێ مسوڵمانان هەر ئەوە بڵێن، بەڵام زۆر لە زانایان ئەم صیغەیان دیاری کردوە، کە ئێمە لە جەژندا دەیڵێین: (اللهُ أَكْبَر اللهُ أَكْبَر اللهُ أَكْبَر اللهُ أَكْبَر) یان دووجار (اللهُ أَكْبَر اللهُ أَكْبَر لاَ إِلَه إلاَّ الله وَاللهُ أَكْبَر وَلِلّهِ الْحَمْد)، دیارە ئەم زیکرە بە چەند جۆرێکی دیکەش هاتوە، بەڵام گرنگ ئەوەیە بەگەورەگرتنی خواو سوپاس‌و ستایشکردنی خواو یەکتایی ڕاگەیاندنی خوای پەروەردگاری تێدابێ، ئیدی بە هەر جۆرێك لەو جۆرانە یادی خوای پەروەردگار بکرێ، یاخود غەیری ئەوانەش کە باسکران، ئەوە هەمووی دەچێتە نێو بازنەی فراوانی یادی خوا کردنەوە، کە لەو سێ ڕۆژانەی تەشریقدا فەرمانی پێکراوەو بە شێوەیەکی تایبەت داکۆکیی لەسەر کراوە، ئەگەرنا هەموو کاتێك پێویستە مسوڵمان هەمیشە خوای بەرزو مەزن لەیادبێ‌و لەیادی دا بێ[1].

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

---

١) شایانی باسە ئێمە لە بەرگی چوارەمی کتێبی: (خواپەرستیی ئیسلامیی) دا لێکۆڵینەوەیەکی تاڕادەیەك تێرو تەسەلمان لەبارەی حەج‌و عومرەوە کردوە، بڕوانە لاپەڕە (١٤٢ هەتا ٣٣٢) چاپی دووەم، نووسینگەی تەفسیر، ساڵی: (٢٠٠٩)ز.

# دەرسی چل و یەکەمین

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان پێکهاتوە لە تەفسیری چوار ئایەت، کە ئایەتەکانی ژمارە (٢٠٤ تاکو ٢٠٧)ن، لە سوورەتی (البقرة)، وەك پێناسەیەکی کورتی بابەتێك کە ئەم چوار ئایەتە قسەی لێدەکەن، دەڵێین: ئەم چوار ئایەتە خوای پەروەردگار تێیاندا باسی دوو جۆرە کەسمان بۆ دەکات، یەکێکیان کە ئەهلی دنیایەو ئەوی دیکەشیان ئەهلی خوایەو بۆ پێناسەی هەر کامێکیان گرنگترین و سەرەکیترین خەسڵەتیان دەخاتەڕوو.

﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يُعۡجِبُكَ قَوۡلُهُۥ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا وَيُشۡهِدُ ٱللَّهَ عَلَىٰ مَا فِي قَلۡبِهِۦ وَهُوَ أَلَدُّ ٱلۡخِصَامِ ﴿٢٠٤﴾ وَإِذَا تَوَلَّىٰ سَعَىٰ فِي ٱلۡأَرۡضِ لِيُفۡسِدَ فِيهَا وَيُهۡلِكَ ٱلۡحَرۡثَ وَٱلنَّسۡلَۚ وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ ٱلۡفَسَادَ ﴿٢٠٥﴾ وَإِذَا قِيلَ لَهُ ٱتَّقِ ٱللَّهَ أَخَذَتۡهُ ٱلۡعِزَّةُ بِٱلۡإِثۡمِۚ فَحَسۡبُهُۥ جَهَنَّمُۖ وَلَبِئۡسَ ٱلۡمِهَادُ ﴿٢٠٦﴾ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَشۡرِي نَفۡسَهُ ٱبۡتِغَآءَ مَرۡضَاتِ ٱللَّهِۗ وَٱللَّهُ رَءُوفُۢ بِٱلۡعِبَادِ ﴿٢٠٧﴾ ﴾.

## مانای وشە بە وشەی ئایەتەکان

((وە لە خەڵکی هی وا هەیە، کە قسەکردنی لەبارەی ژیانی دنیاوە سەرسامت دەکات و خواش بەشایەد دەگرێ لەسەر ئەوەی کە لە دڵیدایە (کە لەگەڵ ئەوەی بە زمان دەیڵێ هەریەکە) لە حاڵێکدا کە سەرسەختترین دوژمنە ﴿٢٠٤﴾ وە هەرکات پشتی کردەوە بە مەبەستی تێکدان لە زەویدا کۆشش دەکات و

کشتوکاڵو وەچە لە بەین دەبات، وە خواش خراپەکارانی خۆشناوێ ﴿٢٠٥﴾ وە هەرکات پێی بگوترێ: پارێز لە خوا بکە ! دەماری گوناهباریی دەیگرێ، جا ئەو کەسە دۆزەخی بەسە ئەوێش خراپترین شوێنی ئیسراحەتە ﴿٢٠٦﴾ وە لە خەڵکی هی وا هەیە کە لە پێناوی بە دەستهێنانی ڕەزامەندیی خوادا خۆی دەفرۆشێ، وە خوا لەگەڵ بەندەکاندا بە بەزەیی یە ﴿٢٠٧﴾ )) .

## شیکردنەوەی هەندێك لە وشەکان

(يُعۡجِبُكَ)؛ (يروقُكَ و يَعْظُمُ في نَفْسِك) واتە: سەرسامت دەکات وە پێت گرنگو گەورەیە.

(وَيُشۡهِدُ ٱللَّهَ)؛ واتە: خوا بە شایەد دەگرێ، خوا دەکاتە شایەدو سوێند دەخوا.

(أَلَدُّ)؛ (ألد) کۆیەکەی (لُدَّ)ە، وە (ألَدُّ: شَدِيد الخُصُومَة في البَاطِل) کەسێك بە ناهەق زۆر موناقەشە بکاتو زۆر مشتومڕ بکات، هەر بۆیەش ئینسانی زۆر موناقەشەکارو مشتومڕکار پەسند نیە.

(ٱلۡخِصَامِ)؛ (الخِصَام: جَمْعُ خَصْمٍ، أو بِمَعْنَى الْخصُومَةَ) واتە: (خِصَام) کۆی (خَصْم)ە، واتە: دوژمن، یان بە مانای ناکۆکییو دەمەقڕە دێ.

(تَوَلَّىٰ)؛ (أَدْبَرَ أو أَعْرَضَ، أو أَخَذَ الوِلاَيَة)، واتە: پشتی تێکرد یان بەمانای: (بوو بە بەرپرس) دێ، کە دوایی باسی دەکەین، کە ئەوە چۆنەو لە سیاقی ئایەتەکەدا مانای چی لێ دێت ؟

(أَخَذَتۡهُ ٱلۡعِزَّةُ بِٱلۡإِثۡمِ)؛ (حَمَلَتْهُ العِزَّةُ عَلَى الإثْم وأَلْزَمَتْهُ، أو أَخَذَتْهُ العِزَّة بِمَا يُؤْثِمُهُ، أو ارتَكَب الكُفْر لِلعِزَّة، أو أَخَذَتْهُ الحَمِيَّة عَنْ قبول الوَعْظِ للأثْم الَّذِي فِي قَلْبِهِ)، واتە: گوناه وای لێکرد کە دەماری پەیدابێ، یاخود دەمارگیریی وای لێکرد کە خۆی توشی گوناح بکات، یاخود دەمار زلییو

خۆ بەزلگرتن وای لێکرد خۆی توشی کوفر بکات، یان دەمارگیریی بە هۆی گوناهی نێو دڵییەوە وای لێکرد کە ئامۆژگاریی وەرنەگرێ.

(اَلْمِهَادُ): (الْمَهْدُ: مَا يُهَيَّىءُ لِلْصَّبِيِّ، والمَهْدُ وَالمِهَادُ: المَكَانُ المُمَهَّدُ المُوَطَّأُ) واتە: (مَهْدُ وَ مِهَادُ) هەردووکیان بە شوێنێك دەگوترێن کە بۆ منداڵ ساز دەکرێ، {جۆلانە، بێشکە، لانکە، شوێنێك کە منداڵ تێیدا ئیسراحەت دەکات}، وە (مهاد) شوێنی ئامادەکراوە.

(يَشْرِي نَفْسَهُ): (الشِّرَاءُ والبَيْعُ يَتَلاَزَمانِ، فَالْمُشْتَرِي دَافِعُ الثَّمَنِ وآخِذُ المُثمَنِ والبَائِعُ دَافِعُ المُثْمَنِ وآخَذَ الثَّمَنِ، وَشَرَيْتُ بِمَعْنَى بِعْتُ أكْثَرُ وَابتَعْتُ بِمَعْنَى اشْتَرَيْتُ أكْثَرُ)، (يَشرِي نَفْسَهُ) یانی: (يَبِيعُ نَفْسَهُ): خۆی دەفرۆشێ، چونکە (يَشْرَي) هەم بە مانای دەفرۆشێ (يَبِيع) دێو، هەم بەمانای دەکڕێ (يَشْتَرِي) دێ، هەردوو واتاکە دەگەیەنێو بە پێی ڕستەکە ماناکەی دیاری دەکرێ، چونکە کڕینو فرۆشتن پێکەوە پەیوەستن، کڕیار نرخ دەداتو نرخ لەسەر دانراو وەردەگرێو، فرۆشیاریش نرخ لەسەر دانراو دەداتو نرخ وەردەگرێ، وە (شَرَيْتُ) زیاتر بەمانای فرۆشتم (بِعْتُ) دێ، وە (ابتَعْتُ) زیاتر بەمانای کڕیم (اشْتَرَيْتُ) دێ، کەواتە: (يَشرِي نَفْسَهُ) یان بەمانای خۆی دەکڕێ، یان بەمانای خۆی دەفرۆشێ دێ، واتە: هەموو شتێکی دنیا دەدات بەڵام خۆی دەکڕێتەوە، یان بەهەشت لە خوا وەردەگرێو خۆی پێ دەفرۆشێ.

(رَءُوفٌ): (الرَّأفَة: الرحْمة الكَثيرة، كَمَا قَالَ الطبَرِي)، واتە: (رَأفَة) یانی: بەزەیی زۆر، وەك (الطبَري) دەڵێ، یان بەزەییەکی تایبەت، کە لە ڕەحمەت بەهێزترە.

## هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتەكان

١) هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم سێ ئایەتەی، كە دەفەرموێ: ﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يُعۡجِبُكَ قَوۡلُهُۥ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا وَيُشۡهِدُ ٱللَّهَ عَلَىٰ مَا فِي قَلۡبِهِۦ وَهُوَ أَلَدُّ ٱلۡخِصَامِ ﴿٢٠٤﴾ وَإِذَا تَوَلَّىٰ سَعَىٰ فِي ٱلۡأَرۡضِ لِيُفۡسِدَ فِيهَا وَيُهۡلِكَ ٱلۡحَرۡثَ وَٱلنَّسۡلَۚ وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ ٱلۡفَسَادَ ﴿٢٠٥﴾ وَإِذَا قِيلَ لَهُ ٱتَّقِ ٱللَّهَ أَخَذَتۡهُ ٱلۡعِزَّةُ بِٱلۡإِثۡمِۚ فَحَسۡبُهُۥ جَهَنَّمُۖ وَلَبِئۡسَ ٱلۡمِهَادُ ﴿٢٠٦﴾ ﴾، {(قَالَ السُدِيُّ: نَزَلَتْ فِي الأَخْنَس بْنِ شُرَيق الثَقَفِي وَهُوَ حَلِيفُ بَنِي زُهْرَة أقبَلَ إلى النَّبِيِّ ﷺ إلى المَدِينَة فأظهَر لَهُ الإسلام وأعْجَبَ النَّبِيَّ ﷺ ذَلِكَ مِنهُ وقَالَ إنَّمَا جِئْتُ أُرِيدُ الإسلام والله يَعْلَمُ إني لَصَادِق و، ذَلِكَ قَولِهِ: ﴿ وَيُشۡهِدُ ٱللَّهَ عَلَىٰ مَا فِي قَلۡبِهِۦ ﴾، ثُمَّ خَرَجَ مِن عِندَ رَسُولَ اللهِ ﷺ فَمَرَّ بِزَرْعٍ لِقَومٍ مِن المُسلمين وحُمُرٍ فأحْرَقَ الزَرع وعَقَرَ الحُمُرَ، فَأَنْزَلَ اللهُ تَعَالى: ﴿ وَإِذَا تَوَلَّىٰ سَعَىٰ فِي ٱلۡأَرۡضِ لِيُفۡسِدَ فِيهَا وَيُهۡلِكَ ٱلۡحَرۡثَ وَٱلنَّسۡلَ ﴾) (أسباب النزول للنيسابوري، ص (٤٣)}، واته: سودیی دەڵێ: ئەم سێ ئایەتە دەربارەی (الأخنس)ی كوڕی (شُرَيق)ی ثەقەفیی هاتنە خوار كە یەكێك بوو لە زلەزلەكانی هۆزی (ثقیف) كە هاوپەیمانی هۆزی بەنی زوهرە بوو، هات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ بۆ مەدینەو مسوڵمانەتیی خۆی نیشاندا، پێغەمبەریش ﷺ پێی سەرسام بوو (دیرە پیاوێكی قسەزان‌و زمان لووس بووە)، وە گوتی: هاتووم تەنیا مەبەستم ئیسلامەو خواش بۆخۆی ئاگای لە دڵمە كە تەنیا بۆ مسوڵمان بوون هاتوومەو هیچی دیكەم مەبەست نیەو ڕاستگۆم، ئنجا ئەوەیە كە دەفەرموێ: ﴿ وَيُشۡهِدُ ٱللَّهَ عَلَىٰ مَا فِي قَلۡبِهِۦ وَهُوَ أَلَدُّ ٱلۡخِصَامِ ﴾، خوا بەشایەد دەگرێ لەسەر ئەوەی كە لە دڵیدایە، لە كاتێكدا كە خواش دەزانێ بێجگە لە درۆو دەلەسەو خیانەت شتێكی دیكە لە ئارادانیە، دوایی لای

پێغەمبەر ﷺ دەرچوو بەلای كشتوكاڵو چەند كەرێكدا تێپەڕی، كە هی كۆمەڵێك لە مسوڵمانان بوون كە لەوێ كە بەستراببوونەوە، كشتوكاڵەكەی سووتاندن‌و گوێدرێژەكانیشی هەمووی پێ بڕین، یاخود سەریبڕین لەمبارەوە خوای پەروەردگار ئەم ئایەتەی نارده خوارێ ﴿ وَإِذَا تَوَلَّىٰ سَعَىٰ فِي ٱلْأَرْضِ لِيُفْسِدَ فِيهَا وَيُهْلِكَ ٱلْحَرْثَ وَٱلنَّسْلَ ﴾.

٢) هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتەی، كە دەفەرمووێ: ﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَشْرِى نَفْسَهُ ٱبْتِغَآءَ مَرْضَاتِ ٱللَّهِ ۗ وَٱللَّهُ رَءُوفٌۢ بِٱلْعِبَادِ ﴾، {(عَنْ عِكْرِمَةَ قَالَ: لَمَا خَرَجَ صُهَيب مهَاجِراً تبِعَهُ أهْل مَكَة فَنَثَلَ كِنَانَتَهُ فَأَخْرَجَ مِنهَا أرْبَعِينَ سَهْمَاً، فَقَالَ: لاتَصِلُونَ إلَيَّ حَتَّى أَضَعَ فِي كُلِّ رَجُلٍ سَهْمَاً ثُمَّ أصِيرَ بَعْدَهُ إلى السّيفِ، فَتَعْلَمُونَ إني رَجلٌ وَقَدْ خَلَفْتُ بِمَكَة قينتين فَهُمَا لَكُم، ونَزَلَتْ عَلَى النَّبِيّ ﷺ: ﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَشْرِى نَفْسَهُ ٱبْتِغَآءَ مَرْضَاتِ ٱللَّهِ ۗ وَٱللَّهُ رَءُوفٌۢ بِٱلْعِبَادِ ﴿٢٠٧﴾ ﴾، فَلَمّا رَآهُ النَّبِيُّ ﷺ قَالَ: أبا يَحْيى رَبِحَ البَيْعُ قَالَ وَتَلَى عَلَيهِ آية) (أخْرَجَهُ الحَاكم برقم: (٥٧٠٠) وقَالَ صَحيح عَلَى شَرط مُسلم، أسباب النزول للنيسابوري، ص (٤٣)، والصحيح المُسنَد مِن أسباب النزول لمقبل بن هادي الوادعي}، واتە: عیكرِمە دەڵێ: ئەم ئایەتە دەربارەی صوهەیبی ڕۆمیی هاتە خاوار، كاتێك ویستی كۆچ بكات (بۆ مەدینە) خەڵكی مەككە شوێنی كەوتن ئەویش تیردانەكەی هەڵڕشت {(كنانة): وەك فیشەك دانە، یان مەخزەنی فیشەك كە تیری تێدەهاوێشترێن} چل تیری پێبوو پێی گوتن: نامگەنێ هەتاكو هەر كامێكتان تیرێكی لێنەدەم {واتە: بەو چل تیرە كە پێمە بەهەر تیرێك كەسێكی پێ دەكوژم، هەڵبەتە صوهەیب زۆر تیر ئەندازێكی عەجایب بووەو تیری بە خەسار نەداوە}، ئنجا دوای ئەوەی تیرەكانم تەواوبوون دەست دەدەمە شمشێر وە بۆ خۆشتان دەزانن چ پیاوێكم (شارەزای بوون)، ئنجا

دوای ئـەوە گـوتی: وەرن باشـتێکی دیکـە بکـەین، مـن دوو کـەنیزەکم لـە مەککـە بەجێهێـشتوون {دوو کـەنیزەکی گـۆرانی بێـژ، چـونکە (قینـة) کـەنیزەکێکی گۆرانی بێژەو، قیمـەتی زیـاترە لــەوەی کـە گـۆرانی نـەزانێ، واتـە: هونەرمەنـد نــەبێ بـە زاراوی ئێـستا}، ئەگــەر لـێم بگـەڕێن بـڕۆم کەنیزەکـەکان بـۆ ئێـوە، گوتیـان: باشــە لێـت دەگەڕێیـن، (ڕەنگـە هەر خـواخوایان بووبێ ڕزگاریانبێ)، ئنجا لەوبـارەوە ئەم ئایەتـە بـۆ پێغەمبـەر ﷺ هاتـە خـوار ﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَشۡرِي نَفۡسَهُ ٱبۡتِغَآءَ مَرۡضَاتِ ٱللَّهِۚ وَٱللَّهُ رَءُوفُۢ بِٱلۡعِبَادِ ﴾، جــا کاتێــك صـوهەیب چـوو بـۆ خزمـەت پێغەمبـەر ﷺ و پێغەمبـەر بینـی ﷺ فـەرمووی: ئـەی بــابی یەحیــا (دیـارە کوڕێکی هـەبووە بـەناوی یەحیــا) بازرگـانییەکـەت قازانجـی کـرد، {دیارە کەس بۆی نەگێڕابوۆوە بەڵکو خوا ئەم ئایەتەی ناردبووە خـوارێو لێی حاڵی کردبوو کە ئەوە صوهەیـب شتێکی وای لـێ ڕوویداوە، ماڵەکەی داوە بۆ ئەوەی ئیمانەکەی سەلامەت بێ، وە ئایەتەکەی بەسـەردا خوێنــدەوە.

## مانــای گشــتی ئایەتەکــان

خـوا ﷻ لـەم چـوار ئایەتـەدا بـە کـورتی باسـی دوو جـۆرە کەسـمان بـۆ دەکـات، یــەکێکیان دوور کـوژی نزیـك خەسـارە، ڕواڵـەت جـوانی پــەنهان وێرانــە، لـەبارەی یەکەمیانەوە دەفەرموێ: ﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يُعۡجِبُكَ قَوۡلُهُۥ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا ﴾، لـە خـەڵکی کەسـی وا هەیـە، کاتێـك کـە باسـی دونیـات بـۆ دەکات پێـی سەرسام دەبـی، پیــــاوێکی قـــسەزانی فەصـــیحی سەرســـامکەر! ﴿ وَيُشۡهِدُ ٱللَّهَ عَلَىٰ مَا فِي قَلۡبِهِۦ ﴾، ئەوەندەش موونافیـقو دەغەڵـە، هەرچەنـدە دەشزانــێ کـە خـوا دەزانــێ درۆ دەکـات، کەچی خوا بەشایەد دەگرێ لەسەر ئەوەی کە لەدڵـی دایە، دەشزانێ خوا ﷻ دەزانێ چی لـەدڵ دایە، جگە لە خیانەتو درۆ هیچی لەدڵـدا نیـە، ﴿ وَهُوَ أَلَدُّ ٱلۡخِصَامِ ﴾، وە خۆشی تەبیعـەتی وایە هەمیشە لە موونافەقەشـەو دەمەدەمدایەو، زۆر پێوە دەچێو دوژمنێکی سەرسەختە، ئەوە حاڵەتی قسەی بەمشێوەیە، با بزانین حاڵەتی کردەیی

چۆنە؟ ﴿ وَإِذَا تَوَلَّىٰ سَعَىٰ فِى ٱلْأَرْضِ لِيُفْسِدَ فِيهَا ﴾، هەتا لە مەجلیسیش یە بەو شێوە قسە دەکات، ئەگەر لەگەڵی بکەویە موناقەشە زۆر مشتومڕکەرێکی سەرسەختەو لە قسەی خۆی دانابەزێ‌و ناسەلمێنێ، وە زۆریش لە قسان دەزانێ‌و بەرانبەرەکەی سەرسام دەکات‌و، ئەگەر بە درۆش بێت ئیقناعی دەکات، کردەوەشی وایە کاتێك لە مەجلیسێك دایەو دوایی هەڵدەستێ‌و پشت لە ئەهلی مەجلیس دەکات، یاخود کاتێك کە بەرپرسیارێتییەکی دەکەوێتە دەست‌و دەبێتە بەرپرس، ﴿ سَعَىٰ فِى ٱلْأَرْضِ لِيُفْسِدَ فِيهَا ﴾، بە زەوی دادەڕوا بۆ ئەوەی خراپەکاریی تێدا بکات ﴿ وَيُهْلِكَ ٱلْحَرْثَ وَٱلنَّسْلَ ﴾، وە کشتوکاڵ‌و وەچە لەبەین دەبا، وەك کوردەواریی خۆمان دەڵێن: (تەڕو وشك پێکەوە دەسووتێنی)، واتە: هیچ ناهێڵا وە هەرچی لێ هەڵکەوێ، بەسەر هیچ شتێکدا باز نادات‌و، هەموو شتێك تێکدەدات‌و خراپ دەکات ﴿ وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ ٱلْفَسَادَ ﴾، وە بەدڵنیایی خواش خراپەکاریی خۆشناوێ. ﴿ وَإِذَا قِيلَ لَهُ ٱتَّقِ ٱللَّهَ أَخَذَتْهُ ٱلْعِزَّةُ بِٱلْإِثْمِ ﴾، وە ئەگەر پێشی بگوترێ پارێز لە خوا بکەو لە خوا بترسێ! ئەوە دەماربەرزییەك دەیگرێ بەهۆی گوناهەوە {ئەگەرنا عیززەتی نەفس بۆ خوا بێ‌و لەپێناو خوابێ‌و لەسەر هەق بێ پەسندە، بەڵام عیززەتی نەفسێك خراپە کە لەسەر ناهەق بێ، ئەوە عیززەتی لووت بەرزییەو بەرەو گوناح ڕاپێچی دەکات} ﴿ فَحَسْبُهُۥ جَهَنَّمُ ۚ وَلَبِئْسَ ٱلْمِهَادُ ﴾، ئەو کەسە دۆزەخی بەسە، وە خراپترینی شوێنی ئیسراحەت‌و ئاسوودەیی دۆزەخە بۆ کافران، ئەوە جۆری یەکەم.

ئنجا بۆمان باسی جۆرێکی دی لە خەڵکی دەکات، کە جۆری یەکەمیان چەندە خراپە، جۆری دووەمیان بە پێچەوانەوە هێندە چاکە، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَشْرِى نَفْسَهُ ٱبْتِغَآءَ مَرْضَاتِ ٱللَّهِ ﴾، خوا ﷻ زۆر بە کورتی باسی ئەم جۆرە کەسەی دووەم دەکات، کە بریتیە لە کەسێك خۆی بۆ خوا ساغ کردۆتەوەو بەندەیەکی ساغ‌و ڕاست‌و بێ فێڵە بۆ خوا، دەفەرموێ: وە لە

خەڵکیدا هەیە کەسانێك، یان جۆرە کەسێك هەیە، کە لەپێناو وەدەستهێنانی ڕەزامەندیی خوادا خۆی دەفرۆشێ ﴿ وَٱللَّهُ رَءُوفٌۢ بِٱلۡعِبَادِ ﴾، وە خوا بەرانبەر بە بەندەکانی زۆر بە بەزەییە، جا لێرەدا هەر ئەوەندەی فەرمووە کە خۆی بۆ خوا دەفرۆشێ، چونکە بەڕاستی هەرکەسێك لەگەڵ خوادا ڕاستی کرد، لەگەڵ خەڵکیشدا ڕاست دەکات و لەگەڵ خەڵکیدا چاك دەبێ، بەڵام لەگەڵ خوادا درۆکردن، ماك و میکرۆبی هەموو خراپەیەکە، وەك چۆن کانیاوێك دەبینی ئەگەر لە سەرچاوەکەیەوە ئاوەکەی لێڵ بوو، ئەوە لە جۆگەدا هەر لێڵ دەبێ، بەڵێ ئینسان ئەگەر لەگەڵ خوادا ڕاست نەبوو، بەدڵنیایی لەگەڵ بەندەکانی خوادا ڕاست نابێ، بەڵکو وەك گوریسی نێو هەمبانە بە قۆرت و پێچ دەبێ.

## چەند مەسەلەیەکی گرنگ

سێ مەسەلەی گرنگم لەم چوار ئایەتە بە پێزەدا دەرهێناون، کە بریتین لە:

**مەسەلەی یەکەم:** لێرە خوا ﷻ باسی دوو جۆرە کەسمان بۆ دەکات، بەپێی سەرنجدانی هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتەکان، دوو کەسن: ئەخنەسی کوڕی شوڕەیق و صوهەیبی ڕۆمیی، جا هەندێك لە توێژەرەوانی قورئان بە هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتەکانەوە چەمك و واتای ئایەتەکانیان لێ گچکە بۆتەوەو گوتوویانە: ئەو چوار ئایەتە دەربارەی ئەو دوو کەسە هاتوونە خوارێ، سێیان دەربارەی ئەخنەسی کوڕی شوڕەیق و یەکێکیشیان دەربارەی صوهەیبی ڕۆمیی، بەڵام زانایان بنچینەیەکیان داناوە کە دەڵێن: (إِنَّ خُصُوصَ السَّبَبِ لايَمنَعُ شُمُولِ الْمَعْنَى)، واتە: تایبەتمەندێتی هۆی هاتنە خوارەوە، ڕێ ناگرێ لە گشتگیرێتی واتا، بەڵێ هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم سێ ئایەتەی یەکەم هەڵوێستی ئەخنەسی کوڕی شوڕەیقە، بەڵام ئایا هەرتایبەتن بەوەوەو واتاکەیان تایبەتە بەوەوە؟! بێگومان نەخێر، چونکە خوا هەرناویشی نەهێناوە، دەفەرموێ: ﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ ﴾، لە خەڵکی هی وا

هەیە، دیارە ئەگەر ناوی هێنابایە تایبەت دەبوو بەوەوە، بەڵام کە دەفەرموێ: ﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ ﴾، مانای وایە ئەو جۆرە کەسە هەر ئەخنەسی کوڕی شورەیق نیەو، ئەو جۆرە کەسە لە هەموو کاتو شوێنێکدا هەر دەبێ، بۆیە خوا ﷻ هێڵە گشتییەکانی ئەو جۆرە کەسایەتییەی خستۆتە ڕوو لەو سێ ئایەتەدا، تاکو هەرکاتێك ئەو سیفەتانەت لە هەرکەسێکدا بینی، بڵێی: ئەوەش لەسەر مەزەبی ئەخنەسی کوڕی شورەیقە، هەروەها بۆ ئەویدیکەش دیسان فەرموویەتی: ﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ ﴾، دیسان ناوی صوهەیبی ڕۆمیی نەهێناوە، تاکو ئەگەر کەسێکت بینی بەو سیفەتانەی کە لە صوهەیبی ڕۆمییدا هەبوون، کە ئامادەبووە ماڵو سامانی خۆی هەموو بەخت بکاتو بگاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ، وە دەستبەرداری دنیابێ، بۆ ئەوەی دینی سەلامەت بێ، هەر کاتێك کەسێکی وات بینی، بڵێی: ئەوە لەسەر ڕێوشوێنی صوهەیبی ڕۆمییە، کەواتە: لێرەدا مەبەست دوو جۆرە کەسە نەك دوو کەس.

**مەسەلەی دووەم:** ئەگەر تەماشای جۆرە کەسی یەکەم بکەین، کە دەتوانین بڵێین ڕواڵەت جوانی پەنهان وێران، یان دوور کوژی نزیك خەسارە، کە لە دوورەوە تەماشای بکەی بۆی دەمری، بەڵام کە لێی ورد دەبیەوەو تێی دەفکری، تەماشای دەکەی هیچی لە باراندا نیەو بۆ حاڵی خۆت دەگری، خوا ﷻ شەش وەسفی لێ هەڵداون:

**سیفەتی یەکەم:** ﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يُعۡجِبُكَ قَوۡلُهُۥ ﴾، لە خەڵکی کەسی وا هەیە بە قسەی سەرسام دەبیت، کەواتە: دەبێ بزانین زۆر کەس قسەی باش دەزانن، وەك کوردەواریی خۆمان دەڵێن: (قسە فەقیرە هەموو کەس پێی دەوێرێ)، (قسە ئاسانە هەموو کەس بۆی دەکرێ) وە کەسێك کە کردەوەی باشی نەبێ، بەڵام زمانی لووس بێ، دەڵێن: (وەستای قسانەو کۆڵەواری دەستانە)، بۆیە قسە ناکرێتە سەنگی مەحەكو ناکرێتە پێوەر بۆ پێوانو کێشان بۆ ناسینی کەسایەتیی.

**سیفەتی دووەم:** ﴿فِي ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا﴾، ئەو قسە باشانەش کە دەیانکات لە چوارچێوەی دنیادان، واتە: تاکە بوارێك کە بتوانێ قسەی تێدا بکات بواری دنیایە، وەك زۆر لە خەڵکی عەلمانییو دنیایی کە دەبینی هیچ لەلای خوا نازانێو هیچی لێ حاڵی نیە، بەلاّم کە دێتە سەر باسی دنیا، بەقسە هیچی تێدا نەهێشتۆتەوە، بەلاّم تەماشای دەکەی کردەوەکانی زۆر پێچەوانەی قسەکانێ، جا لێرەدا خوای بەرزومەزن باسی ئەو جۆرە کەسەی کردوە، بەلاّم لەڕاستیدا خەڵکی دیکە هەیە دەربارەی دینیش دەتوانێ قسە بکاتو ئایەتو حەدیسیش بخوێنێتەوە، کەچی کە لێی ورد دەبیەوە هەموو کردەوەکانیو ژیانی پێچەوانەی ئەو ئایەتو حەدیسانەن کە بە زمان دەیانڵێ.

**سیفەتی سێیەم:** ﴿وَهُوَ أَلَدُّ ٱلْخِصَامِ﴾، (أَلَد) کۆیەکەی (لُدًّ)ە، (أَلَدّ) واتە: کەسێك کە زۆر موناقەشە بکاتو پێوەبچێ، (خِصَام)یش واتە: ناکۆکیی، کە مەبەست پێی کەسێکە دژایەتیی بکاتو شەڕە قسە بکاتو نەسەلمێنێ، واتە: کەللە ڕەقی نەسەلمێن، جا خوای پەروەردگار کە ئەو سیفەتە خراپانەی ئەو جۆرە کەسانەمان بۆ باس دەکات، بۆ ئەوەیە کە خۆمانیان لێ بپارێزین، مسوڵمان نابێ کەیفی بە موناقەشەو موجادەلەو شەڕە قسەبێ، وە نابێ لە شەڕەقسەدا عیناد بێ، نەسەلمێنێ هەر لەسەر قسەی خۆیبێ، وەك کابرا بڵێ: ئەگەر بشفڕێ هەر بزنە !، دەڵێن دووکەس بە شوێنێکدا ڕۆیشتوون، ڕەشاییەکیان دیوە لە دوورەوە، یەکێکیان گوتوویەتی: بزنە ئەوی دیکەیان گوتوویەتی: دالاّشە[1]، دوایی کە لێی نزیك کەوتوونەتەوە فڕیوە، یەکەمیان گوتوویەتی: کاکە نەموت دالاّشە؟! ئەویدیکە گوتوویەتی: وەڵلاهی بشفڕێ هەر بزنە ! بەلاّم مسوڵمان دەڵێ لە هەقێ ئاو ڕادەوەستێ، جارێ مسوڵمان هەر موجادەلەو شەڕەقسەی پێ خۆش نیەو، ئەگەر تووشی شەڕەقسەیەکی ناچارییش بوو، چونکە جاری وا هەیە تەرەفی بەرانبەر تۆ ناچار دەکات،

---

١) دالاّش ، خەرتەل، لاك خۆر، باڵندەیەکی ڕەشی زلە، بەزۆریی گۆشتی لاکە تۆپیو دەخوات.

ئەوە لەو حاڵەتەدا بەشێوەیەکی زۆر جوان قسەدەکاتو موناقەشە دەکات، وەك خوای زانا دەفەرموێ: ﴿ ... وَجَٰدِلۡهُم بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُ ... ﴿١٢٥﴾ ﴾ النحل، وە دواییش هەرکات هەقی بۆ دەرکەوت لەسەر دەستی تەرەفی بەرانبەر، یەکسەر وەریدەگرێ، نەك بڵێ: تازە لەقسەی خۆم نایەمە خوارێ، بۆیە پێغەمبەر ﷺ دەربارەی بابای زۆر موناقەشەکەرو نەسەلمێنو کەللە ڕەق، فەرموویەتی: {(إِنَّ أَبْغَضَ الرِّجَالِ إِلَى اللهِ الأَلَدُّ الخَصِمُ) (رَوَاهُ البُخَارِيُّ برقم: (٢٤٥٧)، وَمُسلم برقم: (٦٧٢٢)، عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا}، واتە: بوغزێنراوترینی پیاوان لەلای خوا کەسی زۆر موناقەشەکەرو زۆر دەمەدەمکەرو نەسەلمێنە.

**سیفەتی چوارەم:** ﴿ وَإِذَا تَوَلَّىٰ ﴾، واتە: ڕوو بەڕوو قسەی باش دەکات، بەڵام پشت ملە کە پشتت تێدەکات خراپ دەڵێو خراپ دەکات، دیارە ئەوەش زۆر خراپەو ئینسان دەبێ جورئەتی هەبێ بەرەو ڕوو قسەی خۆی بکات، ئەگەر ڕەخنەیەکت هەیەو تێبینییەکت هەیە، بەرەو ڕوو قسەی خۆت بکە، وەك کوردەواریی خۆمان دەڵێن: (کەو ئەو کەوەیە کە بەرانبەر کەو بخوێنێ) بەڵام عەیبە کابرا بەرەو ڕوو تەمەڵلوق بکاتو ماستاو بکاتو هیچی تێدا نەهێڵێتەوە لە دڵسۆزیی، بەڵام کە پشتی لەو کەسە کرد، قسەی پێ بڵێ، ئەوە شتێکی زۆر ناجوامێریی و خراپە. ﴿ وَإِذَا تَوَلَّىٰ ﴾، بەڵام ئەم ڕستەیە واتایەکی دیکەشی ئەوەیە، کە هەرکاتێ بەرپرسیارێتی کەوتە دەست (تَوَلَّى) یانی: (صَارَتْ لَهُ وِلاَيةٌ) ویلایەتێكو بەرپرسیارێتییەکی کەوتە دەست، هی وا هەیە هەتا بەرپرس نیە پیاوی زۆر باشە، بەڵام کە تۆزێ بەرپرسیارییەتێکی دەکەوێتە دەست، هەوایەکی دەچێتە کەللەوەو، وەك خەدەمو حەشەم تەماشای خەڵکی دەکات، پێشێ کە هیچی بە دەست نیە، وەك مەڕی خوایە، دوایی کە شتێکی دەکەوێتە دەست، دەبێتە زەردەواڵەو بە خەڵکەوە وەدەدات!

**سیفەتی پێنجەم:** ﴿ سَعَىٰ فِي ٱلۡأَرۡضِ لِيُفۡسِدَ فِيهَا وَيُهۡلِكَ ٱلۡحَرۡثَ وَٱلنَّسۡلَ ﴾، بە زەوی دادەڕوا بۆ ئەوەی خراپەی تێدا بکات وە کشتوکاڵ بفەوتێنێو

وەچە لەبەین بەرێ، واتە ئەو کابرایە نە قسەی بە کەڵك دێ نە کردەوەی (أَعْوَج الْمَقَال وسَيِّءُ الفِعَال)، واتە: قسەشی لارەو کردەوەشی خراپو نالەبارە.

**سیفەتی شەشەم:** ﴿ وَإِذَا قِيلَ لَهُ اتَّقِ اللَّهَ أَخَذَتْهُ الْعِزَّةُ بِالْإِثْمِ ﴾، ئەو هەموو سیفەتە خراپانەی تێدایە، کەچی ئەگەر پێشی بگوترێ: پارێز لە خوا بکە، لە خوا بترسێ، دەست لەو شتانە هەڵگرە، بەهۆی ئەو گوناهەوە کە پێیەتیو بەهۆی ئەو کوفرەوە کە هەڵیگرتوە، دەمارگیرییەكو عینادییەکی بۆ دروست دەبێ، کە ناسەلمێنێو ئامۆژگارییش وەرناگرێ !

**مەسەلەی سێیەم:** خۆ فرۆشتن بە ڕەزامەندیی خوا، خوای پەروەردگار پێناسەی جۆرە کەسی دووەممان بۆ دەکات بە یەك سیفەتو دەفەرموێ: ﴿ وَمِنَ النَّاسِ مَن يَشْرِي نَفْسَهُ ابْتِغَاءَ مَرْضَاتِ اللَّهِ ﴾، لە خەڵکیش هەیە جۆرە کەسێك کە خۆی دەفرۆشێ بەڕەزامەندیی خوا، واتە: ڕەزامەندیی خوای دەستکەوێ، هیچ شتێکی ناوێ، دەڵێ: بەس خوا لێم ڕازی بێ، ماڵو سامانی دنیام ناوێ، هیچ شتێکم ناوێ، ڕووحەکەشم لەپێناو خوادا بەخت دەکەم، کە ئەوە باشترین جۆرە کەسە، وەك چۆن ئەوەی پێشێ خراپترین جۆرە کەسە، جا ڕەنگە یەکێ بڵێ: باشە بۆچی خوا ﷻ کە باسی ئینسانە خراپەکەی کرد، باسی قسەی کردو، باسی ئەوەی کرد، کە هەر لەبارەی دنیاوە لێی دەزانێو، باسی موناقەشەو شەڕەقسەی زۆری کردو، باسی ئەوەی کرد، کە پشت ملە قسە دەکاتو، باسی ئەوەی کرد کە زۆر بە زەرو زیان بەخشە، وە باسی ئەوەی کرد کە ئامۆژگاریی قەبووڵ ناکات، بەڵام لێرەدا کە باسی ئەو ئینسانە چاکە دەکات بۆچی تەنیا سیفەتێکی باس دەکات؟ وەڵامەکەی ئەوەیە: هەرکاتێك ئەو سیفەتە باشە لە ئینساندا هاتە دی، هەموو سیفەتە باشەکانی دیکە دێنێتەدی، ئەگەر ئینسان بەڕاستی لەگەڵ خوادا مامەڵە بکاتو بەڕاستی بەندەی خوا بێ، لەگەڵ خەڵکیشدا

ڕاستو باش دەبێت، خەڵك لە دەستو زمانی سەلامەت دەبێ، بەڕاستی ئەم سیفەتە وەك عەرەب دەڵێن: (كُلُّ الصَيْدِ في جَوْفِ الفَرَى)، واتە: هەموو نێچیرەكان لە هەناوی فەڕادان، (فَرَى): پێم وایە كوردەواریی خۆمان (چوالوو)ی پێ دەڵێن، (فَرَى): دەڵێ نێچیرێكی زۆر قەڵەوو گۆشتنەو ئەگەر ڕاوچی ئەوی لێ هەڵكەوێ، پێویستی بە هیچی دیكە نیە، بەڕاستی هەموو سیفەتە باشەكانیش لەنێو ئەو سیفەتە باشەدانو، ئەگەر ئینسان بەڕاستی خۆی بۆ خوا ساغو یەكلاكردەوەو، تەنیا مەبەستی ڕەزامەندیی خوا بوو، ئەوە هەموو سیفەتێكی دیكەی باشی تێدا پەیدادەبێ.

خوا لەو كەسانەمان بگێڕێ كە بەڕاستی خۆیان بە خوا دەفرۆشنو بەڕاستی مەبەستیان بەدەستهێنانی ڕەزامەندیی خوایەو، لەپێناو وەدەستهێنانی ڕەزامەندیی خوادا هەموو شتێك بەخت دەكەن، وە خوا بە لوتفو كەرەمی خۆی لەو سیفەتە خراپانەمان بپارێزێ كە لە جۆرە كەسی یەكەمدا هەن، ئامین.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی چل دووەمین

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان پێنج (٥) ئایەت لە سوورەتی (البقرة) دەگرێتە خۆی، كە بریتین لە ئایەتەكانی: ژمارە (٢٠٨ تاكو ٢١٢)، لەو پێنج ئایەتەدا خوا ﷻ فەرمان دەكات بە بڕواداران كە بە تەواویی بچنە نێو گەردنكەچییەوە، یاخود بەتەواوی پابەندبن بە ئیسلامەوە، پاشان خوا ﷻ بڕواداران دەترسێنێ لە لادان و خلیسكان، وە فەرمانیشیان پێدەكات ئامۆژگارییشیان دەكات، كە پەند لە میللەتان و ئوممەتانی پێش خۆیان وەربگرن و دواییش باسی ئەهلی كوفرو ئەهلی ئیمان دەكات كە چۆن ئەهلی كوفر بە جوانیی و زرق برقی دنیا سەرسامن و گاڵتە بە ئیمانداران دەكەن و ئەهلی ئیمانیش، كە لە دنیادا خاوەنی ئیمان و ڕەوشت و بەهای بەرزبوون، لە دوارۆژدا لە سەرووی ئەهلی كوفرەوە دەبن، لە بەهەشتە ڕازاوەو نەبڕاوەكانی خواداو كافرانیش لە دۆزەخی نزم و پەستی ئاگریندا.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱدْخُلُوا۟ فِى ٱلسِّلْمِ كَآفَّةً وَلَا تَتَّبِعُوا۟ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيْطَٰنِ ۚ إِنَّهُۥ لَكُمْ عَدُوٌّ مُّبِينٌ ﴿٢٠٨﴾ فَإِن زَلَلْتُم مِّنۢ بَعْدِ مَا جَآءَتْكُمُ ٱلْبَيِّنَٰتُ فَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٢٠٩﴾ هَلْ يَنظُرُونَ إِلَّآ أَن يَأْتِيَهُمُ ٱللَّهُ فِى ظُلَلٍ مِّنَ ٱلْغَمَامِ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةُ وَقُضِىَ ٱلْأَمْرُ ۚ وَإِلَى ٱللَّهِ تُرْجَعُ ٱلْأُمُورُ ﴿٢١٠﴾ سَلْ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ كَمْ ءَاتَيْنَٰهُم مِّنْ ءَايَةٍۭ بَيِّنَةٍ ۗ وَمَن يُبَدِّلْ نِعْمَةَ ٱللَّهِ مِنۢ بَعْدِ مَا جَآءَتْهُ فَإِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ ﴿٢١١﴾ زُيِّنَ لِلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا وَيَسْخَرُونَ مِنَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ۘ وَٱلَّذِينَ ٱتَّقَوْا۟ فَوْقَهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ۗ وَٱللَّهُ يَرْزُقُ مَن يَشَآءُ بِغَيْرِ حِسَابٍ ﴿٢١٢﴾ ﴾.

## مانای وشە بە وشەی ئایەتەکان

((ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە ! بەتەواویی بچنە نێو گەردنکەچیی (یان ئیسلام)ەوە، وە بەدوای هەنگاوەکانی شەیتان مەکەون کە ئەو دوژمنێکی ئاشکراتانە ﴿٢٠٨﴾ وە ئەگەر پاش ئەوەی بەڵگە ڕوونەکانتان بۆ هاتوون، هەڵەتان کرد ئەوە بزانن کە خوا زاڵو کاربەجێیە ﴿٢٠٩﴾ ئایا چی چاوەڕێ دەکەن (پاش ژیانی دنیا) ئەوە نەبێ کە خواو فریشتەکان لە چەند هەورێکی سێبەرداردا بێنو کار لەکار بترازێ، وە کاروبارەکانیش هەر بۆ لای خوا دەگێڕدرێنەوە ﴿٢١٠﴾ لە وەچەی ئیسرائیل بپرسە چەند نیشانەی ئاشکرامان پێداون وە هەر کەسێکیش نیعمەتو چاکەی خوا پاش ئەوەی بۆی دێ بیگۆڕێ بە سپڵەیی ئەوە بێگومان خوا سزای توندە ﴿٢١١﴾ ئەوانەی بێبڕوان ژیانی دنیایان بۆ ڕازێنراوەتەوەو گاڵتەش بەوانە دەکەن کە بڕوایان هێناوە، بەڵام ئەوانەی پارێز دەکەن لەڕۆژی هەڵسانەوەدا لە سەروویانەوەن، وە خوا هەرکەسێك بیەوێ بێ ژمارە ڕۆزیی دەداتێ ﴿٢١٢﴾)) .

## شیکردنەوەی هەندێك لە وشەکان

(ٱلسِّلْمِ): بە دوو واتایان دێ: گەردنکەچیو ئاشتیی، گەردنکەچی بۆ خوا، ئاشتی لەگەڵ خوادا، وە بەواتای (ئیسلام)یش دێت، ئیسلامی بەرجەستەکراو لە قورئانو سوننەدا، وشەی (السِّلْم)یش لە ڕیشەکەیدا لە وشەی: (السَّلْم)ەوە هاتوە، (السَّلْمُ والسَّلامَةُ: التَّعَرِّي مِنَ الآفَاتِ الظاهِرةِ والبَاطنةِ) مانای هەر دوو وشەی (السَّلْمُ والسَّلامَةُ) بریتیە لەوەی کە ئینسان لە دەردو گرفتاریی ڕواڵەتو پەنهان دەربازی بووبێ، خوا ﷻ لە قورئاندا لەبارەی ئیبراهیمەوە دەفەرموێ: ﴿ إِذْ جَآءَ رَبَّهُۥ بِقَلْبٍ سَلِيمٍ ﴿٨٤﴾ ﴾الصافات، واتە: کە هاتە لای پەروەردگاری بە دڵێکی سەلیمەوە. واتە: بە دڵێکی سەلامەتو دوور لە دەردو ئافات.

**(كَآفَّةً )**: وشەی (كافة) لێرەدا واتە: هەمووتان یاخود: هەمووی ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱدۡخُلُواْ فِي ٱلسِّلۡمِ كَآفَّةً ... ﴾، واتە تێكڕاتان بچنە نێو گەردنكەچییەوە، یاخود بچنە نێو هەموو گەردنكەچییەوە، یاخود بچنە نێو هەموو ئیسلامەتییەوەو پابەندبن بە هەموویەوە (الكافة: وَهُوَ مِنَ الكَفِّ وَهُوَ الْمَنْعُ لأَنَّهُ يَمْنَعُ خروج أي فَرِدٍ عَنْهُ) وشەی: (كافة) لە (كف)ەوە هاتوە، واتە: نەهێشتن، چونكە ڕێ لە هەر كام لە تاكەكان دەگرێ لەوە، كە لێی بچنەدەر.

**(زَلَلۡتُم )**: لە (زلّ)ەوە هاتوە، (الزَّلَّةُ: اسْتِرْسَالُ الرِّجْلِ مِنْ غَيْرِ قَصْدٍ)، واتە: خلیسكانی پێ و ڕۆیشتنی بەبێ ئەوەی كە ئینسان بیەوێ، (الْمَزَلَّةُ: المكانُ الزَّلِقُ)، واتە: ئەو شوێنەی كە ئینسان لێی دەخلیسكێ.

**(ظُلَلٍ )**: (ظُلَلْ: جَمْعُ ظُلَّةٍ، كَغُرْفَةٍ وغُرَفٍ)، (ظلة) واتە: هەور، (ظُلَّةٍ) كۆدەكرێتەوە بە (ظُلَلْ)، وەك چۆن (غُرْفَةٍ) بە (غُرَفٍ) كۆدەكرێتەوە، بۆیەش بە هەور دەگوترێ: (ظُلَّة) چونكە سێبەر دەكات.

**(ٱلۡغَمَامِ )**: لە (غَمّ)ەوە هاتوە، (الغَمُّ: سَتْرُ الشَّيءِ، وَمِنْهُ الغَمَامُ لِكونِهِ سَاتِراً لِضَوْءِ الشَّمْسِ)، (غَمّ) بە داپۆشینی شتێك دەگوترێ، بۆیە بە هەور دەگوترێ: (غَمَام)، چونكە ئەویش تیشكی خۆر دادەپۆشێ.

**(وَيَسۡخَرُونَ )**: (أَي يَسْتَهْزِؤُنَ)، واتە: گاڵتە دەكەن.

## هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتەكان

لەبارەی هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو ئایەتەوە، كە دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱدۡخُلُواْ فِي ٱلسِّلۡمِ كَآفَّةً وَلَا تَتَّبِعُواْ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيۡطَٰنِۚ إِنَّهُۥ لَكُمۡ عَدُوٌّ مُّبِينٌ ٢٠٨ ﴾، ئەم بەسەرهاتە گێڕراوەتەوە: {(عَنْ عِكْرِمَةَ قَالَ نَزَلَتْ في عبدالله بن سَلام، وثَعْلَبَةَ، وابن يامين، وأسَد وأُسَيدِ ابني كَعْب، وسَعيدُ بن عمرو، وقَيسِ بن زيد، كُلُّهُم مِن يَهود قالوا: يا رَسُول الله ﷺ السَّبْتُ يَوْمٌ

نَعْظِّمُهُ، فَدَعنا فَلْنُسبِتْ فيهِ، وإنَّ التّوراةَ كِتابُ الله فَدَعنا فلنَقُم بِها باللّيلِ، فَنَزَلَتْ هَذِهِ الآيـة) (أسباب النزول للنيسابوري، ص: (٤٥)، وتفسير الطبري: (٤٠١٩)}[1]، واتە: عیکرِمە دەڵێ: ئەم ئایەتە دەربارەی کۆمەڵێك لەو جوولەکانەی کە مسوڵمان بووبوون: (عبدالله بن سَلام، وثَعْلَبَةَ، وابن يامين، وأسَد وأُسَيْدِ ابني كَعْب، وسَعيدُ بن عمرو، وقَيسِ بن زيد) هاتەخوار، وە هەمووشیان لە زانایانی جوولەکە بوون، دوای ئەوەی کە مسوڵمان دەبن دەڵێن: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆژی شەممە ڕۆژێکە کە ئێمە لە سەردەمی جوولەکایەتیدا بە گەورەمان دەگرت (هەروەك چۆن مسوڵمانان ڕۆژی جومعە وەك جەژنێك تەماشا دەکەن، جوولەکە ڕۆژی شەممەو نەصرانییەکانیش ڕۆژی یەك شەممە)، لێمان بگەڕێ با ئێستاش ڕۆژی شەممە بە گەورە بگرین (کە گەورە گرتنەکە ئەوەبوو لەو ڕۆژەدا هیچ کارو کەسابەتێك نەکەن، ئاگر نەکەنەوەو هیچ شتێك نەکەن)، وە تەوراتیش کتێبی خوایە، لێمان بگەڕێ با لە شەونوێژدا بیخوێنین، ئیدی ئەم ئایەتە هاتە خوار، {کە لە هەموو ڕوویێکەوە پابەندی ئیسلام بن‌و خۆتانی بۆ ساغ‌و یەکلابکەنەوە}.

## مانـــای گشـــتی ئایەتەكـــان

خوا ﷻ ڕوو لە ئەهلی ئیمان دەکات‌و دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ﴾، ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە! کە وەك دوایی باسی دەکەین (ئەوانەی ئیمانتان هێناوە) دەگونجێ مەبەستی یەکەمی پێی ئەو زانایانەی جوولەکە بووبن، کە تازە ئیمانیان هێناوەو هاتوونەتە نێو ئیسلامەتییەوە، بەپێی هۆی هاتنە خوارەوەکەی، بەڵام بێگومان ئەگەر بە پلەی یەکەم ئەوان بگرێتەوە، یان کاتی خۆی ئەوان یەکەم دوێنراو (مخاطب)ی خوای پەروەردگار بووبن، ئەوە مانای ئەوەنییە کە ئەم ئایەتە هەر لەگەڵ ئەوانیەتی، بەڵکو لەگەڵ هەموو ئەهلی ئیمانیەتی، چونکە ئەگەر هەر لەگەڵ ئەوانیبایە ناوی دەهێنان، فڵان‌و فڵان، بەڵام کە ناوی نەهێناون، بەڵکو نازناوێکی گشتی داناوە، مانای وایە هەموو ئەهلی

---

١) بڕوانە: (اللباب النقول في أسباب النزول): (١٢٨)، ص: (٣٨) .

ئیمان‌و یەك یەكی تاكەكانی بڕواداران دەگرێتەوە ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ﴾، ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! ﴿ ٱدۡخُلُواْ فِي ٱلسِّلۡمِ كَآفَّةً ﴾، بەتەواویی بچنە نێو گەردنكەچییەوە، یاخود بەتەواویی بچنە نێو ئیسلامەتییەوە، ﴿ ٱلسِّلۡمِ ﴾، هەم بە مانای گەردنكەچیی دێ‌و هەم بە مانای ئیسلامەتیی دێ، وە بەتەواویی واتە: هەركامێكتان بەتەواویی گەردنكەچبێ، بەتەواویی پابەندبێ بە ئیسلامەوە، ئەوە مانایەكیەتی، یاخود تێكڕاتان گەردنكەچبن‌و پابەندبن بە ئیسلامەوە، دیارە هەموو واتاكانیش لەیەك كاتدا دەگەیەنێ، ئەوەش یەكێكە لەلایەنە ڕەوانبێژییەكانی زمانی عەرەبی، كە ئەو وشەی (كَآفَّةً)یە ئەگەر پەیوەست بێتەوە بە وشەی: ﴿ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ﴾، ئەوە مانای وایە: تێكڕاتان، وە ئەگەر پەیوەست بێتەوە بە وشەی: ﴿ ٱلسِّلۡمِ ﴾، ئەوە مانای وایە: بەتەواویی گەردنكەچبن، پاشان دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تَتَّبِعُواْ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيۡطَٰنِ ﴾، وە بە شوێن هەنگاوەكانی شەیتان مەكەون، واتە: پێ لە شوێن پێی شەیتاندا مەنێن، جا ئایا كەس شەیتانی بینیوە بە ڕێیەك دابڕواو شوێن پێیەكانی دیاربن، تاكو پێیدا بڕۆن ؟! نەخێر، ئەدی مەبەست چییە؟ واتە بەدوای مەكەون، وە ئەو شتانەی كە شەیتان بۆتان دەڕازێنێتەوە لە گوناح‌و خراپە بەدوای مەكەون، وە ئەو طاعەتانەی كە شەیتان دەیەوێ ئێوەیان لێ ساردبكاتەوە، بەقسەی مەكەن، بەڵام بۆچی خوا ﷻ بەو تەعبیرە دەیهێنێ ؟ چونكە هەركەسێك لە شەریعەت لابدات‌و بكەوێتە شوێنی شەیتان، وەك ئەوە وایە شەیتانی كردبێتە پێشەوای خۆی‌و پێ لە شوێن پێی وی دابنێ، جا چەند شتێكی ناشیرینە ئینسان شەیتان بكاتە ئیمام‌و پێشەوای خۆی‌و پێ لە شوێن پێی وی دابنێ، لەحاڵێكدا كە شەیتان دوژمنێكی ئاشكرای ئێمەیە، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّهُۥ لَكُمۡ عَدُوّٞ مُّبِينٞ ﴾، بێگومان شەیتان بۆ ئێوە دوژمنێكی ئاشكرایە، واتە: دوژمنایەتییەكەی خۆی پەنهان نەكردوە، تۆ جاری وا هەیە دوژمنێكت هەیە، نازانی دوژمنایەتییت دەكات یان نا ؟ بەڵام شەیتان ئیعلانی كردوە، شەیتان هەر لەو ڕۆژەوە كە ئادەم وحەووای باب‌و دایكی مرۆڤایەتی

سەلامی خوایان لێبێ، خوا ﷻ ڕێزی لێگرتن، وە ئادەم‌و حەووا ژیانی سەر زەوییان دەستپێکرد، بەڵکو پێش ئەوەش هەر لەسەر ئەوە خوا لەعنەتی لە شەیتان کردو لێی تووڕەبوو، چونکە کڕنووشی ڕێزلێگرتنی بۆ ئادەم نەبرد، ئیدی هەر لەو کاتەوە شەیتان ئیعلانی دوژمنایەتی خۆی کردو گوتی: ﴿... لَأَحْتَنِكَنَّ ذُرِّيَّتَهُۥٓ إِلَّا قَلِيلًا ﴿٦٢﴾﴾الإسراء، بێگومان وەچەی ئادەم هەموو هەڵدەخەڵێتێنم‌و لە ڕێ لادەدەم، کەمێکیان نەبێ، پاشان خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿فَإِن زَلَلْتُم مِّنۢ بَعْدِ مَا جَآءَتْكُمُ ٱلْبَيِّنَٰتُ فَٱعْلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ﴾، جا ئەگەر دوای ئەوەی بەڵگە ڕۆشنەکانتان بۆ هاتوون، خلیسکان‌و بەتەواویی لاتانداو وازتان لە ئیسلام هێنا، یاخود خلیسکان‌و دوایی هەڵسانەوە، چونکە وشەی: ﴿زَلَلْتُم﴾، هەردووکی دەگرێتەوە، هەرچەندە زیاتر هی دووەمیان دەگرێتەوە، واتە: ئەگەر تووشی هەڵەیەك‌و کەموکووڕییەك بوون، بزانن کە خوا زاڵەو کاربەجێیە، زاڵە دەتوانێ تۆڵەتان لێ بستێنێ‌و کاربەجێشە حیکمەتی وا دەخوازێ کە لەسەر چاکە پاداشتتان بداتەوەو، لەسەر خراپە سزاتان بدات، کەواتە: ئاگاتان لەخۆتان بێ، ئەگەر خەڵکی دیکە ڕێی لێ تێکبچێ‌و بخلیسکێ‌و بکەوێ، ڕەنگە جۆرێ لە بیانووی هەبێ، بەڵام ئێوە دوای ئەوەی بەڵگە ڕوون‌و ئاشکراکانتان بۆ هاتوون، هیچ بیانووتان نیە، پاشان خوا ﷻ هەڕەشە دەکات‌و دەفەرموێ: ﴿هَلْ يَنظُرُونَ إِلَّآ أَن يَأْتِيَهُمُ ٱللَّهُ فِى ظُلَلٍ مِّنَ ٱلْغَمَامِ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةُ وَقُضِىَ ٱلْأَمْرُ ۚ وَإِلَى ٱللَّهِ تُرْجَعُ ٱلْأُمُورُ﴾، ئایا چاوەڕێی چی دەکەن، مسوڵمانان‌و کافران‌و تێکڕای بەشەر چاوەڕێی چی دەکەن؟ جگە لەوە کە خوا لە هەوری سێبەرداردا بێت، هەروەها فریشتەکانیشی بێن، وە کاروبار هەمووی تەواو بێت‌و تێك بپەڕێنرێ، وە سەرەنجامیش هەموو کاروبارەکان بۆلای خوا دەگێڕدرێنەوە، واتە: چاوەڕێی چی دەکەن غەیری ئەوەنەبێ کە قیامەت دابێ، وە خوای پەروەردگار بەو شێوەیە کە بۆ خوا شایستەیە بێ، هەروەها فریشتەکانیش لە خزمەتی دابێن، وە دادگایی بەندەکانی بکات، وە دادوەرییان لە نێوانیانیان بکات، وە کاروبارەکانیش بچنەوە بۆ لای خوای دادگەرو سەرەنجام کار لەکار بترازێ!

کەواتە: تا لە ژیـانـدان لەخۆتـان وریـابن، ئەگەرنا لەگەڵ سەرتان لـە ژیـان ئـاوابوو، ئەوە یەکەمین قۆناغی قیـامەتو سـزاو پاداشـت دەسـت پێدەکـات، ئنجا ڕوو لـە پێغەمبەر دەکات ﷺ لە پێش هەموو کەس داو لە دوای ویش ڕوو لە هەر کەسێکی دیکە دەکـات کە قورئـان دەخوێنـێو، بە دوای پێغەمبەر ﷺ دەکـەوێ، کـە پەنـد وەربگـرن لە پێشینانو لە ڕابردووانو دەفەرموێ: ﴿ سَلْ بَنِيٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ﴾، پرسـیار بکـەن لـە وەچـەی ئیـسرائیل، واتـە: جوولەکـەکان، جوولەکـەکان بۆچـی پێیـان دەگوترێـت وەچـەی ئیـسرائیل؟ چـونکە هـەموویان دەچـنەوە سـەر ئیـسرائیلو، ئیسرائیل لەقـەبی یەعقـووبی بـابی یوسـفە سەلامی خوایان لەسەر بێ، وە بـەنی ئیسـرائیل یانی: وەچەی ئیسرائیل، لە ڕۆڵەکانی ئیسـرائل یاخود لـە جوولەکـەکان بپرسـن ﴿كَمْ ءَاتَيْنَٰهُم مِّنْ ءَايَةٍۭ بَيِّنَةٍ ﴾، چـەند نیـشانەی ئاشکرامان پێـداون، کـاتی خـۆی خـوا ﷻ دەریـای سووری بـۆ لـەتکردن پێیـدا پەڕینـەوە، دوایـی هـەوری بـۆ ڕەخساندن لە بیابانی سینادا تـاکو هـەتاو نەیانبـرژێنـێو گـەرمایان نـەبێ، دوایـی گـەزۆو سـەمانیی کە جۆرە باڵندەیەکـە بۆی ڕەخساندن، دوایی لە تاشـە بـەردێکی گەورە دوازدە سەرچاوەی بۆ هەڵقوڵاندن، لەسەر داوای مووسا سەلامی خوای لـێبێ، هـەتا کۆتـایی هـەموو ئـەو مـوعجیزەو نیـشانانە، لێیـان بپرسـە چـەند نیـشانەی ئاشکرامان پێداون، واتە: بۆچی قەدری هەموو ئەو نیعمەتانەی خـوا نازانن‌و بۆچی بڕوا بە کۆتـا پێغەمبەری خوا نـاهێنن کـە موحەممـەدە ﷺ ؟! پاشـان دەفـەرموێ: ﴿ وَمَن يُبَدِّلْ نِعْمَةَ ٱللَّهِ مِنۢ بَعْدِ مَا جَآءَتْهُ فَإِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ ﴾، وە هـەر کەسـێك دوای ئەوەی نیعمەتی خوای بۆ دێ بیگۆڕێ، ئەوە بێگومان خـوا تۆڵەی زۆر تونـدە، بیگۆڕێ بەچی؟ واتە: ئەو نیعمەتە نادیدە بگرێو لەجیاتی ئەوەی سوپاسی لەسـەر بکات، سپڵەیی لە بەرانبەردا بکات، یان مەبەسـت لـەو نیعمەتـە هاتنی پێغەمبـەری کۆتـاییـە ﷺ، هـاتنی هـەرکامێك لـە پێغەمبـەران نیعمـەتێکی گـەورەی خوایـە، گـۆڕینی ئـەو نیعمەتـە ئەوەیـە کـە لـەجیاتی ئـەوەی ئیمـانی پـێ بهێـنن، بـە درۆی دابنـێن ! لـە کۆتاییـدا دەفـەرموێ: ﴿ زُيِّنَ لِلَّذِينَ كَفَرُواْ ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا ﴾، بـۆ ئـەوانـەی

کە بێبڕوان ژیانی دنیا ڕازێنڕاوەتەوەو بۆیان جوانکراوە ﴿ وَيَسْخَرُونَ مِنَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ﴾، گاڵتەش دەکەن بەوانەی کە ئیماندارن‌و پێیان ڕادەبوێرن، ئەوە لە دنیادا ﴿ وَٱلَّذِينَ ٱتَّقَوْا۟ فَوْقَهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ﴾، بەڵام ئەوانەی پارێز دەکەن، واتە: ئەوانەی ئەهلی ئیمانن‌و پارێز دەکەن لەو شتانەی کە خوا پێی ناخۆشن، لە ڕۆژی هەڵسانەوەدا لە سەرووی ئەوانەن ﴿ وَٱللَّهُ يَرْزُقُ مَن يَشَآءُ بِغَيْرِ حِسَابٍ ﴾، وە خوا بەبێ ژماردن هەر کەسێك کە بیەوێ ڕزق‌و ڕۆزیی دەداتێ، ئایا لە سەرووی ئەوانەوەن، یانی: چی ؟ لەڕووی ماددییەوە لە سەرووی ئەوانەوەن، بەهەشت لە سەرێیەو دۆزەخ لە خوارێیە، وە لەڕووی مەعنەوییەوە لە سەرووی ئەوانەوەن، وە لەڕووی ژیان‌و جۆرو چۆنیەتی ژیانەوە لە سەرووی ئەوانەوەن، وشەی: ﴿ فَوْقَهُمْ ﴾، هەموو واتاکان دەگرێتەوە.

## چەند مەسەلەیەکی گرنگ

**مەسەلەی یەکەم:** کە خوا دەفەرمووێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱدْخُلُوا۟ فِى ٱلسِّلْمِ كَآفَّةً ﴾، ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! بە تەواوەتیی بچنە نێو گەردنکەچییەوە یاخود ئیسلامەتییەوە، یان هەمووتان بچنە نێو گەردنکەچییەوە، یان ئیسلامەتییەوە، ئەمە ئەوەی لێ وەردەگیرێ، کە ئێمە بۆ پابەندییمان بە ئیسلامەتییەوە، بە شەریعەتی ئیسلامەوە، نابێ گوڵبژێر بکەین، ئەوە پێتخۆشە پێوەی پابەندبی‌و ئەوەش، کە لەسەر شانت قورسە پێوەی پابەند نەبی، دینی خوا نابێ گوڵبژێری تێدا بکرێ، شەریعەتی خوای پەروەردگار، چ ئەوەی پەیوەندی بە تاکەوە هەیە، چ بە خێزانەوە، چ بە کۆمەڵەوە، چ بە لایەنی سیاسییەوە، دەبێ بە هەموویەوە پابەندبی، خوا ﷻ ئەو یاسایانەی کە داناون‌و ئەو فەرمایشتەی کە ناردوویەتی، دیارە هەمووی پێویستەو نابێ هیچ کەس مافی سەرپشك بوون‌و مافی هەڵبژاردن‌و

گوڵبژێرکــردن لەنێــو دینداریـــیو لەنێــو شـــەریعەتی خــوادا بــەخۆی ڕەوا ببینـێ، ئـنجا (الطبـري) له تەفسـیری ئـەم ئایـەتەدا دەڵـێ(١): {(وَالصَّوَابُ مِنَ القَـولِ فـي ذَلِـكَ عِنـدي أن يُقـالَ إنَّ الله جـلّ ثنـاؤهُ أمَـرَ الـذينَ آمنـوا العَـمَـل بشَـرائِعِ الإسلام كُلِّهَا)، واته: قسەی ڕاستو تەفسـیری ڕاســت لای من لەبــارەی ئەم ڕستە قورئـانیـیەوە، ئەوەیە کە خوای بـەرزو مـەزن فـەرمانی کـردوه بەوانـەی کـه ئیمانیـان هێنـاوە، پابەنـدبن بەکـارکردن بـه بەرنامـەکانی ئیسلام بەتەواویو هیچ شتێکیان لـێ فەرامۆش نەکـەن.

**مەسـەلەی دووەم:** ئایا مـەبەسـت لـه: ﴿ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ﴾، کـێیه؟ وەك پێـشـتـر گـوتم، بـەپێی هـۆی هــاتنه خوارەوەکـەی ئـەو زانایـانەی جوولەکەکــانن کـه هاتبوون مـسوڵمان بووبـوون، وه هەنـدێ پێـشـنیاریان بـۆ پێغـەمبەر ﷺ کــرد کــه هەنـدێ شـتی سـەردەمی جوولەکایـەتی بـەکاربێنن، بـەڵام ئەگـەر تەماشـای ڕواڵـەتی ئایەتەکـەو سـیاقی ئایەتــەکان بکـەی، دەزانــی کــه هــەموو ئیمانــداران دەگرنــەوە، بۆیــەش لەوبــارەوە (الطبـري) دەڵـێ(٢): {(وَقد يدخلُ فـي الـذين آمنـوا المُصَدِّقون بمُحـمَدٍ ﷺ بِمَـا جـاء بـهِ والمُصَدِّقون بِمَـن قَبلَـهُ مِـنَ الأنبيـاءِ الرُّسـلِ وبِمَـا جـاءوا بـهِ وَقـد دَعـا الله كِلا الفَريقَـيـنِ إلـى العمـل بشَـرَائِعِ الإسـلام وحُـدودِهِ والمحافظـة علـى فَرائضـهِ الّتي فَرَضَهـا ونهاهُـمْ عَنْ تضـييعِ شَـيءٍ مِن ذالك فالآية كـافةٌ لِكُـلِّ مَنْ شَـملَهُ اسْـمٌ الإيْمَـانِ فَلاَ وَجـه لِخـصُوص بَعْـضٍ بِهَـا دُونَ بَعْـض)}، واتــه: دەچـێته نێـو: ﴿ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ﴾، ئەوانــەی کـه ئیمانیـان بـه موحەممـەد ﷺ هێنـاوە، وه بـەوەی کـه موحەممـەد هێنــاویەتی (واتــه: مـسوڵمانان)، وه ئەوانــەش کـه پێغەمبـەرانو ڕەوانەکراوانی پێشوویان بەڕاست زانیوەو ئەوەش کە لـه خـوارەوە هێناویانـه، ئەوانیش هەر دەچنه نێو ئەو ڕستەوە، بۆیـه خــواوە ﷻ هــەردوو کۆمەڵەکــه

---

١) (جامع البيان في تفسير القرآن)، ج: (٢)، ص: (٥٦٥).

٢) (جامع البيان)، هەمان بەرگو لاپەڕە.

(واتە: هەم مسوڵمانان، ئەوانەی کە لە بتپەرستیی‌و شیرکەوە هاتوونە نێو ئیسلامەتییەوەو، هەم ئەوانەی پێشتر خاوەن کتێب بوون هاتوونە نێو ئیسلامەتییەوە خوا هەردووکیان) بانگ دەکات، کە پابەندبن بە بەرنامەکانی ئیسلام‌و بە سنوورەکانی ئیسلامەوەو پارێزگاریی بکەن لە فەرزەکانی کە پێویستی کردوون، وە لێی قەدەغە کردوون، کە هیچ کام لە بەشەکانی ئیسلام‌و یاساکانی فەراموش بکەن، بۆیە ئایەتەکە گشتی یە بۆ هەموو ئەوانەی کە بە ئیماندار لەقەڵەم دەدرێن‌و، هیچ مانای نیە تایبەت بکرێ بە هەندێکیانەوە، جیا لە هەندێکیان.

**مەسەلەی سێیەم:** کە خوا دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تَتَّبِعُوا۟ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيْطَٰنِ ﴾، بۆچی وا دەفەرموێ؟ چونکە هەمیشە لادان لە شەریعەت، بەرانبەرەکەی شوێنکەوتنی شەیتانە، تۆ یان دەبێ بە دوای خوا بکەوی‌و بە دوای شەریعەت بکەوی، یان دەبێ بە دوای شەیتان بکەوی، ناکرێ بڵێی: بەدوای شەریعەتی خوا ناکەوم، وە بەدوای شەیتانیش ناکەوم، هەر خودی بەدوای شەریعەت نەکەوتن‌و پابەندنەبوون بە شەریعەتەوە، بە قسەکردنی شەیتانە، ئەمە وەك ئەوە وایە بڵێی: دنیا یان دەبێ تاریك بێ، یان دەبێ ڕووناك بێ، ئەو شتانەی کە دژی یەکن، حەتمەن دەبێ یەکێکیان بێ: یان شەوە یان ڕۆژە، ئەو شتە یان هەیە یان نیە، ئینسان یان دەبێ مسوڵمان بێ یان دەبێ کافر بێ، بڵێی نە مسوڵمانیشم، وە نە کافریشم، ئەوە نابێ‌و هەر کەسێك مسوڵمان نەبوو مانای وایە کافرە، ئەوەی بەدوای شەریعەتی خوا نەکەوتبێ، مانای وایە بەدوای ڕێچکەکانی شەیتان کەوتوەو، بە دوای هەنگاوەکانی شەیتان کەوتوە.

**مەسەلەی چوارەم:** کە خوا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّهُۥ لَكُمْ عَدُوٌّ مُّبِينٌ ﴾، بێگومان شەیتان بۆ ئێوە دوژمنێکی ئاشکرایە، ئەم ڕستەیە بەم شێوەیە، یاخود بە شێوەی دیکە، لە زۆر جێی قورئاندا هاتوەو، خوا ﷻ ئێمەی باش ئاگادارکردۆتەوە لە شەیتان کە دوژمنێکی ئاشکرایە، بۆچی؟ چونکە شەیتان دوژمنایەتی خۆی نەشاردۆتەوەو وەك پێشتر باسمان کرد هەر لە سەرەتاوە ڕایگەیاندوە کە

هەرچی بۆی بکرێ لەدژی وەچەی ئادەم دەیکات، وەك خوا پێی ڕاگەیاندووین‌و لە سووڕەتی (فاطر)دا دەفەرموێ: ﴿ ...إِنَّمَا يَدْعُوا۟ حِزْبَهُۥ لِيَكُونُوا۟ مِنْ أَصْحَـٰبِ ٱلسَّعِيرِ ﴿٦﴾ ﴾ فاطر، واتە: بێگومان شەیتان حیزبی خۆی، کۆمەڵی خۆی بانگ دەکات تاکو بیانکاتە هاوەڵی کڵپەی دۆزەخ، وە هەر کەسێك کۆمەڵی خوا نەبێ، کۆمەڵی شەیتانە، کۆمەڵی خواش ئەوەیە کە بەدوای هیدایەتی خوا دەکەوێ‌و، بەدوای پێغەمبەرانی خوا دەکەوێ، وە هەر کەسێك بەدوای بەرنامەی خواو پێغەمبەرانی خوا (علیهم الصلاة والسلام) نەکەوت، ئەوا بە تەئکید بەدوای وەسوەسەو ڕێچکەکانی شەیتان‌و هاوەڵانی شەیتان دەکەوێ، وە سەرەنجامیش شەیتان کۆمەڵی خۆی بەرەو دۆزەخ بانگ دەکات.

**مەسەلەی پێنجەم:** خوا کە دەفەرموێ: ﴿ فَإِن زَلَلْتُم مِّنۢ بَعْدِ مَا جَآءَتْكُمُ ٱلْبَيِّنَـٰتُ ﴾، ئەوەی لێ وەردەگیرێ کە مسوڵمان دەگونجێ بخلیسکێت‌و هەڵە بکات، بەڵام گرنگ ئەوەیە ئینسان یەکجاریی نەخلیسکێتە خوارێ‌و نەگەڕێتەوە، کە کەوتی دەبێ هەڵسیەوە، وەك گوتراوە: نەکەوتن ئازایەتییە، بەڵام کەوتن‌و هەڵسانەوە ئازایەتیترە، چونکە کەس نیە نەکەوێ، کوردەواریی خۆشمان دەڵێ: (سوار هەتا نەنگلێ نابێتە سوار)، کەواتە: گرنگە کە ئینسان شەیتان تووشی هەڵەیەکی کردو خلیسکاو کەموکوورییەکی هاتە ڕێ، دەست لەخۆی نەشوات‌و لەخۆی نائومێد نەبێ، چونکە شەیتان هەر ئەوەی دەوێ، جاری وا هەیە ئینسان هەڵەیەك کەموکوورییەك ڕووی تێدەکات‌و تووشی گوناهێك دەبێت، بەڵام دوایی بەجۆرێك دەگەڕێتەوە بۆ لای خوا ﷻ کە شەیتان پەشێمان دەبێت لەوەی کە تووشی ئەو هەڵەیەی کردووە، دەڵێ هەرتووشم نەکردبایە باشتر بوو، چونکە هێندە پەشێمان بۆوەو تۆبەیەکی وایکرد حاڵەتی دوای گوناهی باشتربوو لە حاڵەتی پێش گوناهی، هەر لێیگەڕابام‌و تووشی گوناهم نەکردبایە باشتر بوو، هی واش هەیە شەیتان تووشی گوناهێکی دەکات، بۆخۆشی دەبێتە یارمەتیدەری شەیتان‌و بە دوای غەڵەتان دادەڕوا هەتا سەری بە فەتارەت دەچێ !

**مەسەلەی شەشەم:** کە خوا دەفەرمویّ: ﴿ هَلۡ يَنظُرُونَ إِلَّآ أَن يَأۡتِيَهُمُ ٱللَّهُ فِي ظُلَلٖ مِّنَ ٱلۡغَمَامِ وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ وَقُضِيَ ٱلۡأَمۡرُۚ وَإِلَى ٱللَّهِ تُرۡجَعُ ٱلۡأُمُورُ ﴾، دیاره باسی هاتنی خوای بێوێنه وه هاتنی فریشتەکانی خوا دەکات، جا هاتنی فریشتەکان ئەوه بە هەر حاڵ فریشته دروستکراوی خوانو لە ڕووناکیی دروستکراونو دێنو دەچن، بەڵام هاتنی خوا ﷻ دەبێت ئاوا تەفسیر بکریّ: هاتنێك کە بۆ خوا شایستەیە، کە ئێمە نازانین چۆنە؟ گرنگ ئەوەیە خوا دەفەرمویّ: ڕۆژی قیامەتیّ دیّ بۆ ئەو شوێنەی کە دادوەریی تێدا لەنێوان بەندەکانیدا دەکات، ئیدی ئەو هاتنە چۆنە؟ نایزانین، وە فریشتەکانیش لە خزمەتیدا دێن، بەڵام ﴿ فِي ظُلَلٖ مِّنَ ٱلۡغَمَامِ ﴾، لەنێو چەند هەورێکی سێبەرداردا خواو فریشتەکانی دێن، بەشێوه هاتنێك کە ئێمە نایزانین چۆنە ! وەك چۆن ئێمە نازانین خودی خوای پەروەردگار چۆنە ! سیفەتەکانیشیو وە کردەوەکانیشی بەهەمان شێوه نازانین چۆنن ! هەڵبەتە ئەو کردەوانەی کە تایبەتن بەخۆیەوە، دیاره ئەوەش مەبەست پێی ڕۆژی قیامەتە، بە بەڵگەی ئەوەی، کە دەفەرمویّ: ﴿ وَقُضِيَ ٱلۡأَمۡرُۚ وَإِلَى ٱللَّهِ تُرۡجَعُ ٱلۡأُمُورُ ﴾، کاروبار تێکپەڕی، واتە: دادگایی تەواو بوو، وە کاروبارەکانیش سەرەنجام بۆ لای خوا دەچنەوە.

**مەسەلەی حەوتەم:** کە خوا دەفەرمویّ: ﴿ وَمَن يُبَدِّلۡ نِعۡمَةَ ٱللَّهِ مِنۢ بَعۡدِ مَا جَآءَتۡهُ ﴾، دەگونجیّ مەبەست پێی ئەو نیعمەتانە بیّ، کە خوا بە وەچەی ئیسرائیلی داون، یاخود هەر کەسێکی دیکە، کە خوا نیعمەتێکی پێدەدا، ئەویش نیعمەتەکە بگۆڕیّو بیشارێتەوە، یاخود سپڵەیی لە بەرانبەردا بکات، دەشگونجیّ مەبەست لەو نیعمەتە هاتنی کۆتا پێغەمبەر موحەممەد ﷺ بیّ، کە گەورەترین نیعمەتە، وەك دەفەرمویّ: ﴿ لَقَدۡ مَنَّ ٱللَّهُ عَلَى ٱلۡمُؤۡمِنِينَ إِذۡ بَعَثَ فِيهِمۡ رَسُولٗا مِّنۡ أَنفُسِهِمۡ ... ﴿١٦٤﴾ ﴾ آل عمران، واتە: بەڕاستی خوا چاکەی لەگەڵ ئیمانداران کردوه، کە پێغەمبەرێکی بۆ ڕەوانە کردن لە خۆیان، گۆڕینی ئەو

نیعمەتەش ئەوەیە کە مرۆڤ بڕوای پێ نەهێنێ‌و لەجیاتی ئەوەی ئیمانی پێ بێنێ، بەدوای شتێکی دیکە بکەوێ.

**مەسەلەی هەشتەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ زُيِّنَ لِلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا ﴾، بۆ ئەوانەی بێبڕوان ژیانی دنیا جوانکراوە، دەزانن بۆچی؟ چونکە هەر کەسێك بڕوای بە دوارۆژ نەبوو بڕوای بە بەهەشت نەبوو، ژیانی دنیای زۆر لەلا شیرین‌و لەلای گەورەو بە قەدرو قیمەت دەبێ، بەڵام هەر کەسێك ئیمانی بە دوارۆژ هەبوو، ئیمانی بە بەهەشت هەبوو، دنیای لە پێشچاوی بچووك دەبێتەوە، بەڵام هەر کەسێك بەس دنیای شك برد، دنیای زۆر لەلا گەورە دەبێت، بۆیە ئەو کەسەی ئیمانی بەهێز نەبێ، وەختێ کە دەوڵەمەند دەبێ، پێی وایە شتێکی زۆر گەورەی دەستکەوتوە، یان کە دەستەڵاتێکی دەکەوێتە دەست، پێی لە خۆبایی دەبێ، بەڵام ئینسانی ئیماندار وەك دەفەرموێ: ﴿ لِّكَيْلَا تَأْسَوْا۟ عَلَىٰ مَا فَاتَكُمْ وَلَا تَفْرَحُوا۟ بِمَآ ءَاتَىٰكُمْ ۗ وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ كُلَّ مُخْتَالٍ فَخُورٍ ﴿٢٣﴾ ﴾ الحديد، واتە: بۆ ئەوەی ئەگەر شتێکتان لەدەست چوو، زۆر خەمی لێ نەخۆن، وە ئەگەر شتێکتان هاتە دەست، زۆری پێ دڵخۆش نەبن، چونکە هەر چۆن بێ لە سنووری دنیا دایەو، دنیاش بۆخۆی شتێکی کەم‌و کەم بایەخ‌و بچووکەو، هەر بۆ ئەوە دانراوە ئینسان تێیدا تاقی بکرێتەوە.

**مەسەلەی نۆیەم:** کە خوا دەفەرموێ: ﴿ وَٱلَّذِينَ ٱتَّقَوْا۟ فَوْقَهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ ﴾، لەبەرئەوەی ئیمانداران لە دنیادا خۆیان بەرز ڕاگرتوەو نەفسێکی بەرزیان هەبووەو، خاوەنی بەهاو ڕەوشتی بەرز بوون‌و خاوەن دیدو تێڕوانینی بەرز بوون‌و، هەڵسوکەوتی بەرزیان نواندوە، لە قیامەتیش خوا دەیانخاتە شوێنی بەرز، بەڵام بێبڕوایان لەبەر ئەوەی هەمیشە چاویان لە شتی نزم‌و پەستبووەو ڕەوشتیان نزم بووەو هەڵسوکەوتیان نزم بووەو، ئامانج‌و ئاواتیان نزم بووەو، لە نزمییدا ژیاون‌و لە نزمییدا بیریان کردۆتەوە، خوای پەروەردگار دەیانخاتە شوێنی نزمەوەو ئەو بەرزیی‌و نزمیی‌یەش هەم لایەنی ماددیی دەگرێتەوەو هەم لایەنی مەعنەویی.

**مەسەلەی دەیەم:** كە خوا دەفەرموێ: ﴿ وَٱللَّهُ يَرْزُقُ مَن يَشَآءُ بِغَيْرِ حِسَابٍ ﴾، خوا هەركەسێك بیەوێ ڕۆزیی دەداتێ بەبێ ژماردن، یەكێ بۆی هەیە بڵێ: بێگومان خوا خۆی دەزانێ چەندی دەداتێ ! دەڵێین: عەرەب عادەتیان وایە ئەگەر بیانەوێ بڵێن: شتێك زۆر زۆرە، دەڵێن: (بغیرحساب) ئەگەرنا لای خوای زاناو شارەزا، هەموو شتێك سەرژمێریی كراوە: ﴿ وَكُلَّ شَيْءٍ أَحْصَيْنَٰهُ كِتَٰبًا ﴿٢٩﴾ ﴾النبأ، هەموو شتێكیان ژماردوەو سەرژمێر كردوە، بە نووسین و تۆماركردن، چونكە هەموو شتێك دروستكراوی خوایە، دیارە خوا ژمارەی دروستكراوەكانی دەزانێ، بەڵام لێرەدا بەپێی عەقڵی ئێمە قسەكەی فەرمووە، ئایا هیچ كەس دەچێ فەردە نۆكێك دەنك دەنكی بژمێری؟ یان كە دەچێ گەڵابە چەوێك بژمێرێ ؟ بێگومان نەخێر، شتێك زۆربێ عادەتی ئینسان وایە كە نایژمێرێ، جا خوا دەفەرموێ: من بەبێ ئەوەی كە ئێوە بتوانن بیژمێرن، ڕزقو ڕۆزییتان دەدەمێ، ئەگەرنا لەلای خوای پەروەردگار هەموو شتێك سەرژمێریی كراوەو دیارە.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی چل و سێیەمین

## پێناسـەی ئەم دەرسـە

ئەم دەرسەمان سێ ئایەت دەگرێتە خۆی، کە بریتین لە ئایەتەکانی ژمارە: (٢١٣و ٢١٤و ٢١٥) لە سوورەتی (البقرة)، لەم سێ ئایەتەدا خوا ﷻ، سێ حەقیقەتی گرنگ دەخاتەڕوو:

**حەقیقەتی یەکەم:** یەك ڕێزیی خەڵك بەهۆی پابەندییان بە وەحی یەوە پەیدادەبێ، وە پەرتەوازەییان بەهۆی لادان لە وەحی یەوەیە.

**حەقیقەتی دووەم:** ئەوەیە کە بەبێ لە بێژینگدران چوونە بەهەشت خەیاڵ پڵاوە، خەڵك دەبێ لە بێژنگ بدرێ و تاقیبکرێتەوە.

**حەقیقەتی سێیەم:** خوای پەروەردگار قسە دەربارەی ماڵ بەخشین دەکات، کە پێش هەموو کەس باب و دایك وخزم و هەتیوو نەدارو ڕێبوارن، وە هەر شتێك ببەخشن خوای زانا پێی شارەزایە.

﴿ كَانَ ٱلنَّاسُ أُمَّةً وَٰحِدَةً فَبَعَثَ ٱللَّهُ ٱلنَّبِيِّـۧنَ مُبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ وَأَنزَلَ مَعَهُمُ ٱلْكِتَٰبَ بِٱلْحَقِّ لِيَحْكُمَ بَيْنَ ٱلنَّاسِ فِيمَا ٱخْتَلَفُوا۟ فِيهِ ۚ وَمَا ٱخْتَلَفَ فِيهِ إِلَّا ٱلَّذِينَ أُوتُوهُ مِنۢ بَعْدِ مَا جَآءَتْهُمُ ٱلْبَيِّنَٰتُ بَغْيًۢا بَيْنَهُمْ ۖ فَهَدَى ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لِمَا ٱخْتَلَفُوا۟ فِيهِ مِنَ ٱلْحَقِّ بِإِذْنِهِۦ ۗ وَٱللَّهُ يَهْدِى مَن يَشَآءُ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٢١٣﴾ أَمْ حَسِبْتُمْ أَن تَدْخُلُوا۟ ٱلْجَنَّةَ وَلَمَّا يَأْتِكُم مَّثَلُ ٱلَّذِينَ خَلَوْا۟ مِن قَبْلِكُم ۖ مَّسَّتْهُمُ ٱلْبَأْسَآءُ وَٱلضَّرَّآءُ وَزُلْزِلُوا۟ حَتَّىٰ يَقُولَ ٱلرَّسُولُ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مَعَهُۥ مَتَىٰ نَصْرُ ٱللَّهِ ۗ أَلَآ إِنَّ نَصْرَ ٱللَّهِ قَرِيبٌ ﴿٢١٤﴾ يَسْـَٔلُونَكَ مَاذَا يُنفِقُونَ ۖ قُلْ مَآ

أَنفَقْتُم مِّنْ خَيْرٍ فَلِلْوَٰلِدَيْنِ وَٱلْأَقْرَبِينَ وَٱلْيَتَٰمَىٰ وَٱلْمَسَٰكِينِ وَٱبْنِ ٱلسَّبِيلِ ۗ وَمَا تَفْعَلُوا۟ مِنْ خَيْرٍ فَإِنَّ ٱللَّهَ بِهِۦ عَلِيمٌ ﴿٢١٥﴾ ﴾.

## مانای وشە بە وشەی ئایەتەکان

((کاتی خۆی تێکڕای خەڵك یەك کۆمەڵ بوون (واتە: بەهۆی پەیڕەوییان لە وەحی یەوە، بەڵام پاشان بەهۆی لادانیانەوە پەرتەوازە بوون)، جا خوا پێغەمبەرانی مژدەدەرو ترسێنەری ڕەوانەکردنو کتێبیشی بەهەق لەگەڵ ناردن، تاکو دادوەریی لەنێوان خەڵکیدا بکەن، لەوەدا کە تێیدا کەوتوونەتە کێشەوە، وە هیچ کەسیش لەوبارەوە (واتە: لەبارەی کتێبی خواوە) نەکەوتە ڕاجیایی یەوە، جگە لەوانەی کە پێیان درابوو پاش ئەوەی بەڵگە گەلی ڕوونیان بۆ هاتن، بەهۆی سنوورشکێنیی نێوانیانەوە، جا خوا بە مۆڵەتی (بە ویستی) خۆی ڕێنمایی ئەوانەی کرد کە بڕوایان هێنابوو، بەرەو ئەو هەقەی کە تێیدا کەوتبوونە مشتومڕەوە، وە خوا هەر کەسێك بیەوێ دەیخاتە سەر ڕاستەڕێ ﴿٢١٣﴾ یان ئایا (ئەی بڕوادارینە !) پێتان وایە هەروا بە سێنایی بچنە بەهەشتێ، بەرلەوەی ئەوەتان بێتە ڕێ کە هاتە ڕێی ئەوانەی پێش ئێوە ! کە نەداریی و نارەحەتیی یان تووش بوو، وە ڕاتەکێنران هەتا پێغەمبەر ﷺ و ئەوانەی لەگەڵی بڕوایان هێنابوو گوتیان: یارمەتی خوا کەیە ؟ ئاگاداربن بێگومان یارمەتی خوا نزیکە ﴿٢١٤﴾ پرسیارت لێدەکەن چی ببەخشن ؟ بڵێ: هەرشتێك لە ماڵو سامان ببەخشن با بۆ بابو دایك ونزیکانو هەتیوانو نەدارانو ڕێبواران، بێ، وە هەرشتێك لە چاکە بکەن ئەوە مسۆگەر خوا پێی زانایە ﴿٢١٥﴾)) .

## شیكردنەوەی هەندێك لە وشەكان

(أُمَّةً): (والأُمَّـةُ: كُـلُّ جَمَـاعَةٍ يَجْمَعُـهُمْ أَمْـرٌ مَـا، إِمَّـا دِيـنٌ وَاحِـدٌ، أو زَمَـانٌ وَاحِـدٌ، أو مَكَـانٌ وَاحِـدٌ، سَـوَاءٌ كَـانَ ذَلِـكَ الأَمْـرُ الجَـامِعِ تَـسخِيرَاً أو اختِيَارَاً، وجَمعُهَا: أُمَـمٌ)، واتـە: (أُمَّـةُ) كـە لە قورئـاندا زۆر هاتوە، بە چـەند واتـایەك دێ، بـەڵام واتـای زیاتری لە زۆربەی سـیاقەكاندا ئەوەیـە كـە بریتیـە لە كۆمەڵە خەڵكێك كە شتێك پێكـەوە كۆیـان بكـاتەوە، ئایینێـك، یاخـود لە یـەك كـاتـدا بووبـن، یان لـە یـەك شـوێنـدا، ئنجـا ئـەو شـتە كـە كۆیـان دەكـاتەوە، چ شتێك بێ لە ئیرادەی خۆیـان بەدەر بێ، یان بە ئیرادەی خۆیان بێ، وە كۆی (أُمَّة)یش بریتیـە لە (أُمَم)، واتە: كۆمەڵـەكان.

(الْكِتَٰبَ): (والكِتَابُ فِي الأَصْلِ مَصْدَرٌ ثُمَّ سُمِّيَ المَكْتُوبُ فِيهِ كِتَاباً، والكِتَابُ فِـي الأَصْـلِ: اسْمُ لِلصَّحِيفَةَ مَـعَ الـمَكْتُوبِ فِيهِ) واتـە: وشـەی (الكِتَـابُ) لـە بنەڕەتـدا چـاووگ (مَـصْدَر)ەو دوایـی هـەموو ئـەو شـتانەی كـە دەنووسـرێن، ناونراوان (كِتَّابُ)، وە (كِتابُ) لە بنەڕەتدا ناوە بـۆ لەسـەر نووسـراو لەگەڵ ئەوەی كە لەسەری نووسراوە (واتە: پەڕێك كە لەسەری نووسـراوە).

(اخْتَلَفُوا فِيهِ): واتە: تێیدا كەوتوونەتـە ڕاجیایی یـەوە، (وَالإخْتِلَافُ والـمُخَالَـفَةُ أنْ يَأخُـذَ كُـلُّ وَاحِدٍ طَرِيقَـاً غَيْرَ طَرِيـقِ الآخَـرِ فـي حَالِهِ أو قَوْلِهِ واستِعِيـرَ لِلمُنَازَعَـة والـمُجَادَلَة) واتـە: (إخْتِلَافُ) ئەوەیـە كـە هـەركامێك لـەو دوو تەرەفە، یاخود ئەو چەند تەرەفـە، ڕێگایەك بگرێ پێچەوانەی ئـەوی دیكـەبێ لە حاڵ، یان لە قسەكردنیـدا، پاشان بۆ شەڕە قسـەو ناكۆكیی خوازراوەتەوە.

(الْبَيِّنَٰتُ): (البَيِّـنَة: الدَّلَالَـة الوَاضِحَةُ، عَقلِيَـة كَانَت أَوْ مَحْسُـوسَـة)، (بَيِّنَـات) كۆی (بَيِّنَـة)یـە، ئـەمیش واتـە: بەڵگەی ڕوونو ئاشكرا، جا ئـەو بەڵگە ڕوونو ئاشكرایە، چ عەقڵیی بێ، چ بەر هەسـت بێ.

(بَغۡيَۢا بَيۡنَهُمۡ)؛ وشەی (بَغي) واتە: سنوور شكێنیی، (البَغي: طَلَب تَجَاوز الإقتِصَادِ فِيمَا يُتَحَرَّى، تَجَاوزَهُ أمْ لَمْ يَتَجَاوزْهُ)، واتە: (بَغي) بریتیە لەوەی كە ئینسان بیەوێ لەخەت بچێتە دەرێ، جا بۆی بچێتە سەر یان بۆی نەچێتە سەر، واتە: سنوور شكێنیی.

(بِإِذۡنِهِۦ)؛ (والإِذْنُ في الشَّيء: إعْلاَمٌ بإجَازَتِهِ والرُّخصَة فِيهِ، نَحو: ﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن رَّسُولٍ إِلَّا لِيُطَاعَ بِإِذۡنِ ٱللَّهِ ...(٦٤) ﴾ النساء، (أي بإرَادَتِهِ وَأَمْرِهِ)، كە دەفەرموێ: (بِإِذۡنِ ٱللَّهِ )، واتە: بە ئیرادەی خوا، یان بە ویستی خوا، یاخود بە مۆڵەتی خوا، یاخود بە ئاگاداركردنەوەی خوا.

(مَّسَّتۡهُمُ )؛ (وَالْمَسُّ يُقَالُ فِي كُلِّ مَا ينَالُ الإنَسانَ مِن أذىً)، واتە: هەرشتێك لە ئازار تووشی ئینسان بێ پێی دەگوترێ (مَسّ) لە زمانی عەرەبیدا.

(ٱلۡبَأۡسَآءُ)؛ (البُؤسُ والبأسُ والبأسَاء: يَعْني الشِّدَّةُ والمَكْرُوهُ، إلاَّ أنَّ البُؤسَ في الفَقْر والبأساء فِي الْحَرب أكثَر)، هەر كام لە (بؤس و بأسُ و بأساء) بریتیە لە هەر شتێك كە سەخت بێو ئینسان پێی ناخۆش بێ، و لەسەر دڵی قورس بێ، بەڵام لێرەدا مەبەست پێی حاڵەتی نەداریی و هەژاری یە، (بأس)یش بە زۆریی بۆ جەنگ بەكاردێو (بؤس)یش بۆ فەقیریی و نەداریی.

(وَٱلضَّرَّآءُ)؛ (الضُّرُّ: سُوءُ الحَالِ، وَالضَّرَاءُ يُقَابِلُ بِالسَّرَاءِ والنَّعْمَاءِ، والضَرُّ بالنَّفْع)، وشەی (ضُرُّ) بریتیە لەوەی كە ئینسان حاڵی باش نەبێ، بەڵام لێرەدا مەبەست پێی نەخۆشیی یە، یان ناخۆشیی یەو (الضَّراءُ والسَّراء) پێچەوانەی یەكدین، (الضَّراءُ) واتە: نەخۆشیی، یان ناخۆشییو (السَّراء) واتە: خۆشییو شادیی، وە (ضُرّ) و (نفع)یش دژی یەكن، واتە: زیانو سوود.

(وَزُلۡزِلُواْ)؛ (وَالتَّزَلْزُلُ: الإضْطِرَابُ، أي: زُعْزِعُوا مِنَ الرُّعْبِ)، وشەی (زَلْزَلَة)، واتە: جووڵاندن، (زُلْزِلوا)، واتە: ڕاتەكێنرانو جووڵێنران، كە مەبەست پێی

ناڕەحەتیی‌و گرفتارییەکە کە ئینسان بلەرزێنێ، چونکە ئینسان ئەگەر حاڵی باشبێ، لە شوێنی خۆی دامەزراوە، بەڵام ئەگەر بکەوێتە نێو سەختیی‌و ناڕەحەتیی‌یەوە، دەجووڵێ‌و هاوسەنگیی تێکدەچێ.

(يُنفِقُونَ): (نَفَقَ الشَّيءُ: مَضَى وَنَفِدَ، وَالإنفَاقُ قَد يَكُونُ فِي المَالِ، وَفِي غَيرِهِ). وشەی (يُنفِقُونَ) واتە: دەبەخشن، چونکە: (نَفَقَ الشَّيءُ) واتە: تەواو بوو، سەرف بوو جا لە ماڵ بێ، یان غەیری ماڵدا.

(خَيْرٍ): (الخَيْرُ: مَا يَرْغَبُ فِيهِ الكُلُّ، كَالعَقْلِ مَثَلاً، وَالعَدْلِ، والفَضْلِ، والشَّيءِ النَّافع، وَضِدُّهُ الشّرُّ)، وشەی (خَيْرُ) هەر شتێکە کە خەڵك ڕەغبەتی بۆی هەبێت، وەك: عەقڵ، دادگەریی، بەخشندەیی، وە هەرشتێکی باش پێی دەگوتری (خَيْر)، وە هەرشتێکی زیانبەخش پێی دەگوترێ (شَرٌّ)، وە خێرو شەڕ پێچەوانەی یەکن، وە لێرەدا مەبەست لە (خَيْر) ماڵ‌و سامانە، کە دیارە هەموو کەس ڕەغبەتی ماڵ‌و سامانی هەیە، وەك لە شوێنی دیکەشدا دەفەرموێ: ﴿ ... إِن تَرَكَ خَيْرًا ... ﴿١٨٠﴾ ﴾ البقرة، ئەگەر خێری لە دوای خۆی بەجێهێشت، واتە : ماڵ‌و سامان.

## هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتەکان

١) هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتەی، کە دەفەرموێ: ﴿ أَمْ حَسِبْتُمْ أَن تَدْخُلُوا۟ ٱلْجَنَّةَ وَلَمَّا يَأْتِكُم مَّثَلُ ٱلَّذِينَ خَلَوْا۟ مِن قَبْلِكُم ۖ مَّسَّتْهُمُ ٱلْبَأْسَآءُ وَٱلضَّرَّآءُ وَزُلْزِلُوا۟ حَتَّىٰ يَقُولَ ٱلرَّسُولُ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مَعَهُۥ مَتَىٰ نَصْرُ ٱللَّهِ ۗ أَلَآ إِنَّ نَصْرَ ٱللَّهِ قَرِيبٌ ﴾، {(أَخْرَجَ ابنُ جَرِيرٍ وابنُ المُنذِرِ وعَبدُالرَّزَاق عَنْ قَتَادَةَ أَنَّ هَذِهِ الآيَةَ نَزَلَتْ فِي يَوْمِ الأَحْزَابِ أَصَابَ النَّبِيَّ ﷺ يَومَئِذٍ وأَصحَابُهُ البَلاءُ وحُصِرَ)}[1]، واتە: قەتادە

---

١) (فَتحُ القَدير)، ج: (١)، ص: (٢٨٢)

دەگێڕێتەوە کە ئەم ئایەتە لەکاتی جەنگی ئەحزابدا هاتنە خوار، کە پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانی بەڕێزی خوا لێیان ڕازی بێ، تووشی بەڵاو گرفتاریی زۆر بوونو ئابڵووقە دران. بەو بۆنەوەیەوە خوا ئەم ئایەتەی نارده خوارێ.

٢) هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتەی، کە دەفەرموێ: ﴿ يَسْـَٔلُونَكَ مَاذَا يُنفِقُونَ قُلْ مَآ أَنفَقْتُم مِّنْ خَيْرٍ فَلِلْوَٰلِدَيْنِ وَٱلْأَقْرَبِينَ وَٱلْيَتَٰمَىٰ وَٱلْمَسَٰكِينِ وَٱبْنِ ٱلسَّبِيلِ ۗ وَمَا تَفْعَلُوا۟ مِنْ خَيْرٍ فَإِنَّ ٱللَّهَ بِهِۦ عَلِيمٌ ﴿٢١٥﴾ ﴾، {(أَخْرَجَ ابنُ المُنذِرِ أنَّ عمرو بن الجموح سَأَلَ رَسُولَ اللهِ ﷺ مَاذَا نُنفِقُ مِن أَموَالِنا وَأينَ نَضَعُها؟ فَنَزَلَت)}[1]، واتە: (عمرو بن الجموح) (کە یەکێك بوو لە هاوەڵان خوا لێیان ڕازیبێ) پرسیاری لە پێغەمبەری خوا کرد ﷺ گوتی: چ شتێك لەماڵی خۆمان ببەخشین؟ وە بە کێی ببەخشین؟ ئیدی ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە.

## مانای گشتی ئایەتەکان

خوا ﷻ لەم سێ ئایەتەدا – وەك پێشتر گوتمان – سێ حەقیقەتی مەزنو گرنگ دەخاتەڕوو، لە ئایەتی یەکەمیاندا دەفەرموێ: ﴿ كَانَ ٱلنَّاسُ أُمَّةً وَٰحِدَةً ﴾، خەڵك هەموویان یەك کۆمەڵ بوون، زۆربەی توێژەرەوانی قورئان دەڵێن: ئەوە مەبەست دوای ئادەمە، لە دوای ئادەم خەڵك یەك کۆمەڵ بوونو لەسەر خوا بە یەکگرتن (توحید)و خواپەرستیی بوون، لەسەر ڕێی خوا بوون، دوایی کە لە سەردەمی ئادەم دوورکەوتنەوە، خەڵکی خراپیان لەنێودا پەیدابووو ڕێیان لێ تێکچووو پەرتەوازە بوون ﴿ فَبَعَثَ ٱللَّهُ ٱلنَّبِيِّـۧنَ مُبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ ﴾، ئنجا خوا پێغەمبەرانی خۆی ڕەوانەکردوە کە مژدەدەربن بۆ ئەوانەی کە ڕێی ڕاست دەگرن، وە ترسێنەربن بۆ ئەوانەی کە لادەدەن. ئەوە واتایەکیەتی، وە واتایەکی دیکەی ئاوایە، ﴿ كَانَ ٱلنَّاسُ أُمَّةً وَٰحِدَةً ﴾، خەڵك هەموویان یەك کۆمەڵ بوون

---

١) سەرچاوەی پێشوو، ج: (١)، ص: (٢٨٣) .

لەسەر شیركو كوفر، بەلام من ئەم مانایە بەدوور دەزانم، هەرچەندە ئەم مانایە بە لەبەرچاوگرتنی ڕواڵەتی ئایەتەكە ڕۆشنترە، چونكە مانای یەكەم پێویستی بەوە هەیە وشەیەك (تقدیر) بكرێ، وەك: (فَاختَلَفُوا، فَانْحَرَفُوا)، ﴿ فَبَعَثَ اللَّهُ النَّبِيِّينَ ... ﴾، بەمانای یەكەمیان زیاتر پێدەچێ، چونكە هیچ كاتێك لەدوای هاتنی ئادەمەوە ﷺ بەشەر هەمووی لەسەر كوفر كۆنەبۆتەوە، تۆزێك تروسكایی وەحیو پەیامی خوا لەنێو هەر كۆمەڵێكدا هەر ماوەتەوە، جا خوا پێغەمبەرانی ناردن كە موژدەدەرو ترسێنەربن ﴿ وَأَنزَلَ مَعَهُمُ الْكِتَابَ بِالْحَقِّ ﴾، وە كتێبی لەگەڵ ناردنە خوار بە هەق، كتێبەكانی خوا هەر بەهەق دێن، وە هەر هەقیان تێدایە ﴿ لِيَحْكُمَ بَيْنَ النَّاسِ فِيمَا اخْتَلَفُوا فِيهِ ﴾، بۆ ئەوەی ئەو كتێبەی خوا لەنێو خەڵكدا حوكم بكاتو دادوەریی بكات لەوەدا كە تێیدا كەوتوونەتە ڕا جیاییو پێیان بڵێ: كامەیان لەسەر هەقە كامەیان لەسەر ناهەقە، ﴿ وَمَا اخْتَلَفَ فِيهِ إِلَّا الَّذِينَ أُوتُوهُ مِن بَعْدِ مَا جَاءَتْهُمُ الْبَيِّنَاتُ بَغْيًا بَيْنَهُمْ ﴾، لە كتێبی خواشدا، یان لە دینی خواشدا نەكەوتوونەتە ڕا جیایی یەوە، مەگەر ئەوانەی كە پێشتر كتێبی خواو ئایینی خوایان پێدرابوو، وە بەڵگە ئاشكراكانیشیان بۆ هاتبوون، ئەدی بۆچی كەوتنە ڕاجیایییەوە ﴿ بَغْيًا بَيْنَهُمْ ﴾، بەهۆی سنوور شكێنییو زوڵمو دنیا ویستیو هەواو ئارەزووپەرستیی یەوە، ﴿ فَهَدَى اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا لِمَا اخْتَلَفُوا فِيهِ مِنَ الْحَقِّ بِإِذْنِهِ ﴾، جا خوا ڕێنمایی ئەوانەی كرد كە ئیمانداربوون بۆ ئەو شتە كە تێیدا كەوتبوونە ڕاجیایییەوەو، ڕێنمایی كردن بەرەو هەق بەویستو خۆیو بە ئیزنی خۆی ڕێنمایی ئەوانی كرد، كە هەق بدۆزنەوە لەنێو ئەو جەنگەڵستانی باتیڵەدا، كە خەڵكی تێیدا كەوتوونەتە ڕاجیایییەوە.

﴿ وَاللَّهُ يَهْدِي مَن يَشَاءُ إِلَىٰ صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴾، خواش ﷻ ڕێنمایی هەر كەسێك دەكات كە بیەوێ، بەرەو ڕاستە شەقامی خۆی، بەلام خوا ڕێنمایی كێ دەكات؟ ڕوونی كردۆتەوە وەك لە شوێنی دیكەدا دەفەرموێ: ﴿ وَيَهْدِي إِلَيْهِ مَن يُنِيبُ

(١٣) ﴾ الشورى، واتە: خوا ڕێنمایی ئەو کەسانە دەکات کە بەرەو خوا دەگەڕێنەوە، بەڵام ئایا خوا ڕێ لە کێ تێکدەدا؟! ﴿ كَذَٰلِكَ يُضِلُّ ٱللَّهُ ٱلْكَٰفِرِينَ (٧٤) ﴾ غافر، خوا بێبڕوایان گومڕا دەکات، ئەگەرنا خوا لە خۆڕا نافەرموێ: هیدایەتی وی دەدەم هەر لەگۆترەو، ئەویش سەر لێدەشێوێنم هەر لە گۆترە ! خوا هیدایەتی کەسێك دەدات، کە خۆی بیەوێ هیدایەت بدۆزێتەوەو عەودالّی هیدایەتی خوا بێ‌و بۆی تامەزرۆبێ، ئەدی ڕێ لە کێ تێك دەدا ؟ ڕێ لە کەسێك تێك دەدا، کە هیدایەتی لەبەرچاوەو قەبووڵی ناکاو ڕەفزی دەکات، ئنجا دێتە سەر بابەتی دووەم‌و دەفەرموێ: ﴿ أَمْ حَسِبْتُمْ أَن تَدْخُلُوا۟ ٱلْجَنَّةَ وَلَمَّا يَأْتِكُم مَّثَلُ ٱلَّذِينَ خَلَوْا۟ مِن قَبْلِكُم ﴾، دیارە لێرە دوێنراوی یەکەم پێغەمبەر ﷺ‌و هاوەڵانی بەڕێزی بوون، بەڵام ئایا ئایاتەکە تایبەتە بە هاوەڵانی بەڕێزەوە؟ بێگومان، نەء، هەرچەندە بەپێی هۆی هاتنە خوارەوەکەی کە لەکاتی جەنگی ئەحزاب (خەندەق)دا هاتۆتە خوارێ، پێش هەموو کەس بۆ ئەوان هاتۆتە خوارەوەو ئەوانی دواندوە، بەڵام لە دوای وانەوە ئێمەش دەدوێنێ‌و ئێمەش دەگرێتەوە. ﴿ أَمْ حَسِبْتُمْ أَن تَدْخُلُوا۟ ٱلْجَنَّةَ ﴾، ئایا پێتان وایە بچنە بەهەشتێ ﴿ وَلَمَّا يَأْتِكُم مَّثَلُ ٱلَّذِينَ خَلَوْا۟ مِن قَبْلِكُم ﴾، بەڵام جارێ ئەوەی کە هاتۆتە پێش میللەتانی پێش ئێوەو هاتۆتە ڕێی ئەوان‌و تووشی ئەوان بووە، جارێ ئێوە تووشتان نەبووە ! واتە دەتانەوێ بەبێ ئارەق بچنە بەهەشتێ ! دەتانەوێ هەروا ڕێتان بە گوڵان بۆ چێنرابێ‌و هەورازو نشێوتان نەیەتە پێش، پێتان وایە ڕێی بەهەشتێ هەروا سووك‌و سادەیە ؟! دوایی باسی ئەوە دەکات کەچی هاتۆتە ڕێی ئەوانەی پێش ئێمە: ﴿ مَّسَّتْهُمُ ٱلْبَأْسَآءُ وَٱلضَّرَّآءُ وَزُلْزِلُوا۟ ﴾، هەژاریی‌و نەخۆشیی پێیانەوە نووسا ﴿ مَّسَّتْهُمُ ﴾ وەك چۆن ژاردارێك بە ئینسانەوە دەچەسپێ بۆئەوەی پێوەی بدات، ئاوا هەژاریی‌و گرفتاریی‌و ناخۆشییان پێوە لکا ﴿ وَزُلْزِلُوا۟ ﴾، وە ڕاتەکێنران‌و

چەندان ناڕەحەتییـان تووش بـوو، ﴿حَتَّىٰ يَقُولَ ٱلرَّسُولُ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَعَهُۥ مَتَىٰ نَصْرُ ٱللَّهِ﴾، بە جۆرێك ڕاتەكێنران، بەجۆرێـك تووشی گرفتاریی‌و نەداریی‌و هـەژاریـی‌و برسـێتی‌و تـرس‌و ناڕەحـەتیـی بـوون، وە تووشـی نـەخۆشـیی‌و ناخۆشـیی بـوون، هـەتا پێغەمبـەرەكەیان ﷺ و ئەوانەی كـە لەگـەڵی ئیمانیـان هێنـابوو، گەیشتنە ڕاددەیـەك گوتیـان: دەبێ یارمەتی خـوا كەنگـێ بێ؟ واتە: بە پەلەپەل‌و هـەڵەهەڵ كـەوتن‌و ناڕەحــەت بـوون ﴿أَلَآ إِنَّ نَصْرَ ٱللَّهِ قَرِيبٌ﴾، ئاگـاداربن ! یارمــەتی خــوا نزیكە، زانایان دەڵێن: چ وەختێك تاریكی شەوێ زۆر سـەخت دەبێتـەوە، بەرەبـەیان لە هەموو وەختان نزیكترە، كە دەچیە نێو قووڵایی شـەوێوە، لە بەرەبەیان نزیك دەبیەوە، كەواتە: وەختێك مسوڵمانان زیاتر ناڕەحەت دەبن‌و گرفتار دەبن، بابزانـن كە دەرووی لێكـرانەوە یان لـێ نزیكتـرە، وەك لێـرە دەفەرمــوێ: ﴿أَلَآ إِنَّ نَصْرَ ٱللَّهِ قَرِيبٌ﴾، ئاگاداربن یارمەتی خوا نزیكە، بۆ كەسانێك كە زۆر ناڕەحەت بوون‌و زۆر تووشـی گرفتاریی بوون، یارمـەتی خــوا ﷻ بـۆ ئەوانـە زۆر نزیكـە، بـەڵام كەسێك بیەوێ هەر لە ڕێوە كە پشـووە بایـەك لێــدا، یەكسـەر یارمـەتی خـــوای بـۆ بـێ ! ئەوە خەیـاڵ پـڵاوە، نەخێر جارێ ماوتـە دەبێ تۆزێ ڕاپتـەكێنرێـی خـۆت بە خـوا بناسـێنی، دیارە خوا ئێمە دەناسێ، بـەڵام خـوا دەیەوێ خۆمـان بناسێنین، كە چین؟ مـەعدەنەكەمان چـۆنـە ؟!

ئنجـا دێتــە سـەر بابـەتی سـێیەم‌و دەفـەرموێ: ﴿يَسْـَٔلُونَكَ مَاذَا يُنفِقُونَ﴾، پرسیارت لێدەكـەن چی ببەخشـن، چ جۆرە ماڵـێك ؟ ئەوان پرسیارێكـیان كـردوە، بـەڵام خـوا ﷻ وەڵامـی دوو پرسـیاران دەداتــەوە، ئـەوان پرسـیاریان كـردوە چـی ببەخشـن ؟ بەڵام خـوای پەروەردگـار بۆیـان ڕوونـدەكاتـەوە: چـی ببەخشـن، وە بـە كێش ببەخشـن ؟ دەفەرموێ: ﴿قُلْ مَآ أَنفَقْتُم مِّنْ خَيْرٍ﴾، بڵێ: هەر ماڵێكی باشـتان بەخـشی، كـە دیـارە ئەوەشـی لێوەردەگیـرێ، كـە ماڵێــك تـۆ پێـت چـاك نیـە مەیبەخشـە، چونكە لە شوێنی دیكەدا دەفـەرموێ: ﴿لَن تَنَالُواْ ٱلْبِرَّ حَتَّىٰ تُنفِقُواْ مِمَّا

﴿تُحِبُّونَ وَمَا تُنفِقُوا۟ مِن شَىْءٍ فَإِنَّ ٱللَّهَ بِهِۦ عَلِيمٌ ﴿٩٢﴾﴾ آل عمران، واتە: ناگەنە پلەی چاکیی، هەتا ماڵێك كە حەزی لێدەکەنو بۆخۆتان خۆشتان دەوێ نەیبەخشن، شتێك كە خۆشت دەوێ ئەوە ببەخشە، نەك شتێك كە بە كەڵك نایەت، بەڵام ئایا ئەوەی كە دەبەخشرێ بە كێ ببەخشرێ؟! وەڵام دەداتەوەو دەفەرموێ: هەرشتێكی چاك كە بەخشیتان، با پێش هەموو كەس: ﴿فَلِلْوَٰلِدَيْنِ﴾، بۆ بابو دایكتان بێ ﴿وَٱلْأَقْرَبِينَ﴾، وە بۆ خزمانو نزیكان بێ، ﴿وَٱلْيَتَٰمَىٰ﴾، وە بۆ هەتیوان، ﴿وَٱلْمَسَٰكِينِ﴾، وە بۆ نەدارانو هەژاران. ﴿وَٱبْنِ ٱلسَّبِيلِ﴾، وە بۆ رێبواران، رێبوارو پەككەوتەو كەسێك كە غەریبە. ﴿وَمَا تَفْعَلُوا۟ مِنْ خَيْرٍ فَإِنَّ ٱللَّهَ بِهِۦ عَلِيمٌ﴾، وە دڵنیاش بن هەر چاكەیەك بكەن، خوا پێی زانایە. واتە: پێویست ناكات رووپامایی بۆ خەڵكی بكەنو پێشانی خەڵكی بدەن، خوا بۆ خۆی لێی ئاگادارەو ئەگەر بۆ خوا دەیبەخشی، بە تەماشاكردنی خوا ﷻ بەس بكەو، پێویست ناكات بیكەی بە هەراو باسی بكەی خوای زاناو شارەزا بۆخۆی دەیزانێو، بەسە كە ئەو بیزانێو فریشتەكان بۆت بنووسن.

## چەند مەسەلەیەكی گرنگ

**مەسەلەی یەكەم:** دەربارەی ئەو رستەیەی، كە دەفەرموێ: ﴿كَانَ ٱلنَّاسُ أُمَّةً وَٰحِدَةً﴾، وەك پێشتریش باسمان كرد، دەگونجێ مەبەست پێی ئەوەبێ كە خەڵك لەسەر خوا بەیەكگرتنو ئیمان كۆبۆتەوە، بەڵام دوایی لایان داوەو لەسەر ئیمانو كوفر تووشی راجیایی بوونو هەندێكیان ئیمانو هەندێكیان كوفریان هەڵبژاردوەو، پێغەمبەران هاتوون بۆ راستكردنەوەی لارەكانو دەرخستنی پێكانی ئیماندارانو بەهەڵەداچوونی كافران، وە دەشگونجێ مەبەست ئەوەبێ كە پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) هاتوون ئەو خەڵكە كە لەسەر ئیمانو

خواپەرستیی کۆبۆتەوە، خۆ ڕاجیاییان هەردەبێ لە هەندێ شتدا، کێشەو مشتومڕو ناکۆکییان هەردەبێ، جا پێغەمبەران (علیهم والصلاة والسلام) پەیتا پەیتا هاتوون بۆ ئەوەی نوختە بخەنە سەر پیت لەو شتانەدا کە تێیاندا کەوتوونەتە ڕاجیاییەوە، ئەگەر واتایەکەی دیکەشی بێ کە خەڵك لەسەر شیركو كوفر كۆبوونەوە ئەو كاتە ماناكەی كاتێك ڕاست دەردەچێ، کە بڵێین: زۆربەی خەڵك لەسەر شیركو كوفر كۆبۆتەوە، نەك هەمووی، چونكە هیچ كاتێك لە دوای هاتنی پێغەمبەرانەوە (علیهم الصلاة والسلام) بەشەر هەمووی لەسەر كوفر كۆنەبۆتەوەو بەشی ئەوەندەی هەر تێداماون كە پێیان بگوترێ بڕوادار.

**مەسەلەی دووەم:** خوا پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) بە دوو شت پێناسە دەكات، دەفەرموێ: ﴿ فَبَعَثَ اللَّهُ النَّبِيِّينَ مُبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ ﴾، خوا پێغەمبەرانی ڕەوانەكردن مـوژدەدەرو ترسێنەربوون، یاخود دڵخۆشكەرو ورياكەرەوە بوون، چونكە (مُبَشِّرِينَ) كۆی (مُبَشِّر)ە، واتە: دڵخۆشكەر، (تَبشير)یش، واتە: دڵخۆشكردنو موژدە بە خەڵكی دان، وە (مُنذِرِينَ) كۆی (مُنذِر)ە، (إنذَار)یش، واتە: خەڵك ترساندن، یاخود خەڵك ورياكردنەوە، كەواتە: پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) هاتوون تاكو ئەوانەی كە ڕێی خوا دەگرنو بەندایەتیی بۆ خوا دەكەن، دڵیانخۆش بكەن موژدەیان پێ بدەن، كە هەم لە دنیاو هەم لە دوارۆژدا سەرفرازن، وە ئەوانەش كە ڕێی خوا ناگرن، هاتوون بیانترسێننو ورياياں بكەنەوە كە ئەگەر بێتو لەسەر ئەو ڕێیە بەردەوام بن، هەم دنیاتان ژین تاڵیی بێو هەم دوارۆژیشتان ماڵ وێرانییو پەشێمانیی دەبێ، جا ئەمە ئەوەی لێوەردەگیرێ، كە بەشەر پێویستی بە هەر كام لەو دووانە هەیە، پێویستی بەوە هەیە كە لەسەر شتی باش هان بدرێو دڵخۆش بكرێو سوپاسو تەقدیر بكرێ، وە لەسەر هەڵەو كەموكوڕییش، سەرزەنشت بكرێو لۆمە بكرێو سزا بدرێ، چونكە بەشەر بەو دووانە نەبێ چاك نابێ.

**مەسەلەی سێیەم:** ڕستەی: ﴿ وَأَنزَلَ مَعَهُمُ ٱلْكِتَٰبَ ﴾، ئەوەی لێوەردەگیرێ، کە هیچ پێغەمبەرێك نەبووە خاوەن کتێبو بەرنامە نەبووبێ، چونکە (کتاب) واتە: بەرنامە، بەڵام مەرج نیە هەرکامیان کتێبێکی ئاوای لەنێو دووبەرگاندا بۆ هاتبێ، چونکە قورئانیش کە هاتوە لەنێو دووبەرگاندا نەبووەو دوایی نووسراوەتەوە، بەڵام هیچ پێغەمبەرێك نەبووە (علیهم الصلاة والسلام) پەیامێکی پێ نەبێ، واتە بەرنامەیەکی پێ نەبێ، ئەدی جیاوازیی (نَبِي)و (رَسُول) چییە؟

(نَبِي): ئەوەیە بەرنامەی خۆی پێبووە، بەڵام بەدوای بەرنامەی ئەو پێغەمبەرەی پێش خۆیشی کەوتوەو بەرنامەکەی سەربەخۆ نەبووە، واتە: لەڕووی هێڵە گشتییەکانەوە شوێنکەوتووی پێغەمبەری پێش خۆی بووە.

(رَسُول)یش: ئەوەیە کە بەرنامەیەکی سەربەخۆی خۆی پێ بووە، هەرچەندە هەموو پێغەمبەرانیش لە هێڵە گشتییەکانی دینداریدا خاوەن یەك بەرنامە بوون.

**مەسەلەی چوارەم:** ڕستەی: ﴿ لِيَحْكُمَ بَيْنَ ٱلنَّاسِ فِيمَا ٱخْتَلَفُوا۟ فِيهِ ﴾، بۆ ئەوەی لەنێو خەڵکیدا دادوەریی بکەن، لەوەدا کە تێیدا کەوتوونەتە ڕاجیاییەوە، ئەوەی لێ وەردەگیرێ کە هەمیشە وەحیو پەیامو شەریعەتی خواو کتێبەکانی خوا، ئەگەر خەڵك وەك پێویست لێیان تێبگات پێیانەوە پابەندبێ، کێشەکانیان کە لێیان ئاڵۆزکراونو ئەو گرفتانەی کە هەیانن، بۆیان شی دەکەنەوەو هەقو ناهەق لێك جیادەکەنەوە، بە پێچەوانەی ڕێچکەو بەرنامە دەستکردەکانەوە، کە بەزۆریی هەقو باطیڵیان تێدا تێکەڵەو کەمتر وایەو بتوانن هەقو باطیڵ لێك جیابکەنەوە، بۆچی؟ چونکە هەر بەرنامەیەك کە ئینسان دایدەنێ دەکەوێتە ژێر کاریگەریی میزاجی ئەو ئینسانەوە، جا ئەو ئینسانە ئەگەر تاکێك بێ بەلای خۆیدا دەیشکێنێتەوەو، ئەگەر قەومێك بەلای قەومەکەیداو، ئەگەر چین وتوێژێك بێ بەلای چینو توێژەکەیداو، ئەگەر عەشیرەتێك بێ

بەلای عەشیرەتەکەیدا، بەلام خوا کە بەرنامە دادەنێ، بەلای کەسدا دایناشکێنێ، چونکە هەموویان بۆ خوا وەك یەکن، هەموو تاکەکان، هەموو رەنگەکان، هەموو رەچەڵەکەکان، هەموو تیرەکان، هەموو گەلەکان، هەموو شوێنەکان، بۆ خوای پەروەردگار وەك یەکن، بۆیە بەرنامەی خوا، بەیەك چاو تەماشای هەمووان دەکات، بەلام تۆ تەماشا بکە، رێچکەی سەرمایەداریی دێنێ، لە قازانجی دەوڵەمەندەو لە زەرەری فەقیرە، رێچکەی ئیشتراکیی دێنێ، بە حیساب لای چینی کرێکاری گرتوە، بەلام لەسەر حیسابی هەق‌و مافی خەڵکی دەوڵەمەندە، بیرۆکەی عەرەبایەتیی دێنێ، لەسەر حیسابی کوردو تورکەو بە قازانجی عەرەبە، بیرۆکەی کوردایەتیی دێنێ (بەمانا نەتەوە پەرستییەکەی) بە قازانجی کوردەو بە زەرەری عەرەب‌و تورکە، وە هەروەها... بەلام ئیسلام بە یەك چاو تەماشای هەموو گەلەکان‌و هەموو تیرەکان‌و هەموو توێژەکان‌و هەموو تاکەکان‌و، هەموو رەگەزەکان دەکات، جارجار خەڵکی عەلمانیی دەڵێن: پیاو سالاریی‌و ژن سالاریی‌و مرۆڤ سالاریی ... نا ! لە ئیسلامدا شەریعەت سالاریی هەیە، شەرعی خوا بەسەر هەمووان‌دا حاکمە، پیاوو ئافرەت وەك یەکن‌و لایەنگیریی نیە بەلای پیاودا لەسەر حیسابی ئافرەت، هەروەك لایەنگیریی ئافرەتیش ناکات لەسەر حیسابی پیاو، بۆچی؟ چونکە نێرو مێ، رەش‌و سپی، عەرەب‌و عەجەم، بۆ خوای پەروەردگار هەموو وەك یەکن.

**مەسەلەی پێنجەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ بَغۡيَۢا بَيۡنَهُمۡۖ ﴾، بەهۆی چییەوە خەڵك دەکەوێتە کێشەو مشتومڕو ڕا جیاییەوە؟ دیارە بەلام بەهۆی ستەم‌و دەستدرێژیی‌و، بەهۆی ئەوەوە کە چاو دەبڕنە هەقی یەکدی‌و، بەهۆی ئەوەوە کە کابرا بەهەقی خۆی بەس (إكتفاء) ناکات‌و دەیەوێ هەقی ئەوی دیکەش بۆخۆی بەرێ، جا لەڕووی سیاسییەوە بێ، لەڕووی ئابورییەوە بێ، لەڕووی کۆمەڵایەتییەوە بێ، ...هتد، هەموو کێشەو مشتومڕەکانی خەڵك بەهۆی سنوور شکێنیی‌و بەهۆی سنوور بەزاندنەوە، سەر هەڵدەدەن.

**مەسەلەی شەشەم:** کە خوا دەفەرموێ: ﴿ فَهَدَى ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لِمَا ٱخْتَلَفُواْ فِيهِ مِنَ ٱلْحَقِّ بِإِذْنِهِۦ ﴾، خوا ڕێنمایی ئەوانەی کرد کە ئیمانیان هێنابوو، بۆ هەق لەوەدا کە تێیدا کەوتبوونە ڕاجیایی‌و کێشەو مشتومڕەوە، ئەوەی لێوەردەگیرێ، کە ئینسان بەهۆی ئیمانەوە دەتوانێ سەردەرکات لە ڕاجیایی‌و کێشەو مشتومڕەکان، وە پاشانیش بەهۆی شوێنکەوتنی شەریعەتی خواوە، ئینسان دەربازی دەبێت لەو گرفتاریی‌و کێشەو مشتومڕانە کە لەنێو کۆمەڵگادا پەیدادەبن، وە میللەت هەتا زیاتر ملکەچ بێ بۆ شەریعەتی خواو بۆ ئایینی خوا، کەمتر تووشی کێشەو مشتومڕو نیزاع‌و ناکۆکیی دەبێت.

**مەسەلەی حەوتەم:** ئەم ئایەتە کە دەفەرموێ: ﴿ أَمْ حَسِبْتُمْ أَن تَدْخُلُواْ ٱلْجَنَّةَ وَلَمَّا يَأْتِكُم مَّثَلُ ٱلَّذِينَ خَلَوْاْ مِن قَبْلِكُم ﴾، دیارە ئەو (أ) هەمزەیە، هەمزەی (الإستفهام الإنكاري)ی پێ دەڵێن، واتە: پرسیارکردنێکی نکووڵییکەرانە، وەك لە کوردەواریی خۆماندا دەڵێ: (ئەوە ئاو نیە؟!) ئاوە لەبەر چاوت، ئەوە ئاو نیە؟! بۆ نایخۆیەوە، یان بۆ وێنە: یەکێك بە یەکێك دەڵێ: توخوا تۆش ئادەمیزادی؟! دەشزانێ کە ئادەمیزادە، جا خوا ﷻ لێرەدا دەفەرموێ: ئایا پێتان وایە بچنە بەهەشتێ ! بێ ئەوەی ئەو شتانەی کە تووشی میللەتانی پێش ئێوە بوون، تووشی ئێوەش بن؟ واتە شتی وا قەت ناگونجێ ئینسان بچێتە بەهەشت بەبێ ئەوەی کە تاقیبکرێتەوەو تووشی گرفتاریی‌و نەخۆشیی‌و ناخۆشیی‌و غەم‌و هەژاریی‌و نەداریی‌و ناڕەحەتیی، ببێ، واتە با ئینسان ئەو خەیاڵە پلاوە نەکات، ئنجا عەجایب ئەوەیە جاری واش هەیە خەڵکێکی مسوڵمان کە ئیمانی بێهێزە کە تووشی گرفتاریی بوو، لەخۆی دەکەوێتە گومانەوەو دەڵێ: ڕەنگە ئێمە ڕێگەکەمان غەڵەت کردبێ، ئەها تووشی گرفتاریی بووین، یان ئەگەر کەسێکی بینی لەسەر ئیسلام تووشی گرفتاری بوو، دەڵێ تەماشای بەدەستی خۆی خۆی تووش کردو خۆی گرفتار کرد ! بێخەبەر لەوەی ئەگەر تۆ مسوڵمان بی هەر تاقی دەکرێیەوە، بەڵێ جاری وا

هەیە بەهۆی هەڵەی خۆمانەوە تووشی هەندێك گرفتاریی دێین، بەڵام مەرج نیە هەرکاتێك تووشی گرفتاریی‌و ناڕەحەتیی‌و بووین، لەبەر ئەوەبێ کە هەڵەمان کردوە، بەڵکو هەر سروشتی دین وایەو ئەهلی باطیلْ بەهەق ڕازی نین‌و ئەهلی زوڵم بە عەدل ڕازی نین‌و ئەهلی کوفر بە ئیمان ڕازی نین‌و، ئەگەر ئیمانداری بەڕاستی بی لێت قەبووڵ ناکەن[1]، جا خوا دەفەرموێ: ﴿مَّسَّتۡهُمُ ٱلۡبَأۡسَآءُ وَٱلضَّرَّآءُ وَزُلۡزِلُواْ﴾، نەداریی‌و نەخۆشییان تووش بووو ڕاتەکێنران، ئەمەش ئەوەی لێوەردەگیرێ کە ئێمە بە زۆر شێوە تاقی دەکرێینەوە، هەر بە شتێك‌و دوو شتان نا، وەك لە شوێنی دیکەدا خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿وَلَنَبۡلُوَنَّكُم بِشَيۡءٖ مِّنَ ٱلۡخَوۡفِ وَٱلۡجُوعِ وَنَقۡصٖ مِّنَ ٱلۡأَمۡوَٰلِ وَٱلۡأَنفُسِ وَٱلثَّمَرَٰتِۗ وَبَشِّرِ ٱلصَّٰبِرِينَ ١٥٥﴾ البقرة.

**مەسەلەی هەشتەم:** ئەم ڕستەیە: ﴿حَتَّىٰ يَقُولَ ٱلرَّسُولُ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَعَهُۥ مَتَىٰ نَصۡرُ ٱللَّهِ﴾، هەتاکو پێغەمبەر ﷺ و ئەوانەی لەگەڵیدا ئیمانیان هێنابوو، گوتیان: یارمەتی خوا کەی دێ؟ ئەوە دەگەیەنێ کە دواکەوتنی یارمەتی خوای پەروەردگار دەبێتە هۆی سەغڵەتیی‌و پەلەپەلکردن، تەنانەت بۆ پێغەمبەرانیش (علیهم الصلاة والسلام)، چونکە پێغەمبەرانیش هەر ئینسان بوون، تووڕە بوون‌و ناڕەحەت بوون‌و هەستیان بە ئازار کردوە، خۆ ئەگەر وا نەبووایە هیچ ئازایەتیی تێدا نەدەبوو بۆ پێغەمبەران، ئێستا مەلائیکە هیچ ئازایەتی تێدانیە خواپەرستیی بکەن، چونکە نە سەرمایان دەبێ، نە گەرمایان دەبێ، نە تینوویان دەبێ، نە برسییان دەبێ، نە خەویان دێ، وە لە ئازارو مردنێ ناترسێن‌و...هتد، بەڵام بۆ ئینسان ئازایەتیی یە کە سەرمای دەبێ گەرمای دەبێ، تێنووی دەبێ، برسی دەبێ لە مردن دەترسێ، بەڵێ: پێغەمبەرانیش

---

١) لە نامیلکەی: (تاقیکردنەوەی خوا بۆ بەندەکانی، چییەو چۆنە؟)دا، بە وردیی باسی ئەم مەسەلەیە کراوە، بڕوانە: چاپی دووەم/٢٠١١ – نووسینگەی تەفسیر، ئاڵەی (١٦) لە زنجیرەی: (بابەتە هەنووکەیی یەکان.

(عليهم الصلاة والسلام) لە هەموو ئەو شتانەدا کە دێنە ڕێی بەشەرو بەسەر بەشەر دێن، بەشدار بوون، چونکە ئەوانیش بەشەربوون، وە فەرقی پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) لەگەڵ غەیری خۆیاندا، هەر ئەوەیە کە وەحییان بۆ هاتوە: ﴿ قُلۡ إِنَّمَآ أَنَا۠ بَشَرٞ مِّثۡلُكُمۡ يُوحَىٰٓ إِلَيَّ ... ﴿١١٠﴾ ﴾ الكهف، بەڵام دیارە ئیمانیان لە خەڵك بەهێزتر بووە، بۆیە تەحەممولیشیان زیاتر بووەو، صەبریشیان زیاتر بووە، خۆڕاگرترو پشوودرێژترو دامەزراوتر بوون.

**مەسەلەی نۆیەم:** ئەو ڕستەیەی، کە خوا تێیدا دەفەرموێ: ﴿ أَلَآ إِنَّ نَصۡرَ ٱللَّهِ قَرِيبٞ ﴾ وەك پێشتریش گوتم: واتە: بۆ کەسانێکی تاقیکراوەی سەغڵەتو نارەحەت، کە زۆر نارەحەت بوون، بۆ ئەوان یارمەتی خوا نزیکە، نەك بۆ کەسێك هەر لەرێوە دوو هەنگاوان هەڵێنێو بڵێ کوا یارمەتی خوا ؟ بۆ دیار نیە؟ جارێ بڕۆ بڕۆ دەبێ زۆر بڕۆیو نارەحەتبیو گرفتاربیو زۆر سەغڵەتبی، ئەوجار بڵێ: کوا یارمەتی خوا ؟ کە ئەوکاتە بە تەئکید نزیکە.

**مەسەلەی دەیەم:** ﴿ يَسۡـَٔلُونَكَ مَاذَا يُنفِقُونَ ﴾ ، ئەوان پرسیاریان کردوە چی ببەخشن، بەڵام خوای کاربەجێ وێڕای ئەوەی، کە بۆی ڕوون کردوونەوە چی ببەخشن، کە (خَيۡرٖ) ببەخشن، واتە: ماڵی چاكو پەسند، شتێك نا، کە بۆ خۆتان ناتانەوێ بەڵکو شتی باش ببەخشن، وێڕای ئەوە بۆشی ڕوونکردوونەوە بە (کێ)شی ببەخشن، چونکە وەك چۆن بەخشین گرنگە، ئەوەش هەر گرنگە کە بە کێی دەبەخشیو دەیدەی بە کێ؟ ئنجا ئەگەر ڕیزبەندییەکەشی تەماشا بکەین دەبینین زۆر شتێکی مەنتیقی یە: پێشێ بابو دایکی باس کردوون، کە دیارە لێرەدا مەبەست ئەوەنیە خێرو صەدەقەیان پێ بدرێ، بەڵکو مەبەست ئەوەیە تۆ ماڵی لەخۆ زیادت پێش هەموو کەس بابو دایکت هەقی پێوەیە، بەڵکو جاری وایە دەبێ لە خۆشت بگریەوە بۆ بابو دایکت، چونکە لە هەموو کەس زیاتر هەقیان لەسەرتە، ئنجا نزیکانو خزمان، ئنجا هەتیوان، ئنجا هەژارو نەدار، ئنجا ڕێبوار پێ بەپێ، واتە: مسوڵمان دەبێ عاقڵو حەکیمو

لێزان بێ، ئەگەر پارەو سامانێکی هەبوو، دەبێ ڕێزبەندیی دابنێ، کوێ وە کێ شایستەترە ؟! پێشی لەوێدا دابنێ، ئنجا دوایی ئەویدیکە، ئنجا دوایی ئەویدیکە، دەبێ ڕیزبەندییەك کە شەرع داینەوەو عەقڵو مەنتقیش پشگیریی دەکات، بەپێی ئەوە ڕیزبەندیی دابنێ، بۆ چۆنیەتی ماڵ بەخشینی خۆی، نەك بۆ وێنە: کابرا بیست جار حەجی کردوە، دەچێ دەیکاتە حەجی بیستو یەکەم، بەڵام دراوسێشی هەیە بیست ساڵە لە خانووی کرێ دایە، ئێ کاکی خۆم پارەی دە (١٠) لەو حەجانە، بدە بەو دراوسێیەت کە لە خانووی بەکرێ دایەو خانووێکی بۆ پێ بکڕە ! من زەمانەتت دەکەم خوای بە بەزەیی خێری زیاتر لەو دە حەجە سوننەتەت بۆ دەنووسێ، چونکە یەك حەج لە ژیانی ئینساندا فەڕزەو ئەوی دیکە هەمووی سوننەتە، بۆیە لەجیاتی ئەوەی دە حەجی سوننەت بکەی، وەرە دوو کابرای خاوەن منداڵی سەلکەو پێچکە کە لە خانووی بەکرێ دایە، ڕزگار بکە لە ژیانی کرێچیەتی، جا بۆیە ئینسان دەبێ لە ماڵ بەخشیندا عاقڵو لێزان بێ، کە بەداخەوە زۆر لە مسوڵمانان لە چۆنیەتی ماڵ بەخشینی خۆیاندا، تووشی هەڵەو کەموکووڕیی‌و کرچو کاڵیی دێن، شتێك کە ڕەنگە مسوڵمانان زۆر پێویستییان پێ نەبێ، یان بۆ قیامەت پاداشتێکی وای نەبێ، ماڵەکەی تێدا دەبەخشێ، کەچی شتێکی دیکە زۆر پەکی کەوتوەو، لەوانەیە پاداشتەکەشی زۆر زۆر گەورەبێ، ناچێ لەوەدا بیبەخشێ، ئەوەش زۆری دەگەڕێتەوە بۆ ئەوە کە خەڵك وەك پێویست حاڵی نەبووە، کە دەبێ چۆن ماڵی خۆیان ببەخشن‌و لە کوێدا دایبنێن، یان ئیخلاس‌و بۆ خوا ساغ بوونەوەیان وەك پێویست نیە، یان هەردووك نەخۆشیی: حاڵی نەبوون‌و ساغ نەبوونەوەیان هەن.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی چل و چوارەمین

## پێناسەی ئەم دەرسە

لەم دەرسەماندا تەفسیری سێ ئایەت دەکەین لە سوورەتی (البقرة)، کە بریتین لە ئایەتەکانی ژمارە: (٢١٦و ٢١٧و ٢١٨)، کە باسی پێویست بوونی جەنگ دەکەن لەسەر بڕواداران، کە هەرچەندە لەسەر دڵیشیان قورس و زەحمەتە، بەڵام هەر خوای کاربەجێ دەزانێ خێرو بەرژەوەندی مسوڵمانان لەچی دایە ! وە باسی قەدەغەبوونی جەنگ کردن لە مانگە حەرامەکاندا دەکەن، وە باسی هەڵگەڕانەوە لە ئیسلام دەکەن، کە چ تاوانێکی گەورەیەو، چ سزایەکی سەختی دواڕۆژ، چاوەڕێی بابای هەڵگەڕاوە دەکات ! وە باسی جیهادو کۆچکردن لە پێناوی خوادا دەکەن، کە مایەی مسۆگەرکردنی بەزەیی و لێبوردنی خوان.

﴿ كُتِبَ عَلَيْكُمُ الْقِتَالُ وَهُوَ كُرْهٌ لَّكُمْ ۖ وَعَسَىٰ أَن تَكْرَهُوا شَيْئًا وَهُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ ۖ وَعَسَىٰ أَن تُحِبُّوا شَيْئًا وَهُوَ شَرٌّ لَّكُمْ ۗ وَاللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴿٢١٦﴾ يَسْأَلُونَكَ عَنِ الشَّهْرِ الْحَرَامِ قِتَالٍ فِيهِ ۖ قُلْ قِتَالٌ فِيهِ كَبِيرٌ ۖ وَصَدٌّ عَن سَبِيلِ اللَّهِ وَكُفْرٌ بِهِ وَالْمَسْجِدِ الْحَرَامِ وَإِخْرَاجُ أَهْلِهِ مِنْهُ أَكْبَرُ عِندَ اللَّهِ ۚ وَالْفِتْنَةُ أَكْبَرُ مِنَ الْقَتْلِ ۗ وَلَا يَزَالُونَ يُقَاتِلُونَكُمْ حَتَّىٰ يَرُدُّوكُمْ عَن دِينِكُمْ إِنِ اسْتَطَاعُوا ۚ وَمَن يَرْتَدِدْ مِنكُمْ عَن دِينِهِ فَيَمُتْ وَهُوَ كَافِرٌ فَأُولَٰئِكَ حَبِطَتْ أَعْمَالُهُمْ فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ ۖ وَأُولَٰئِكَ أَصْحَابُ النَّارِ ۖ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ ﴿٢١٧﴾ إِنَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَالَّذِينَ هَاجَرُوا وَجَاهَدُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ أُولَٰئِكَ يَرْجُونَ رَحْمَتَ اللَّهِ ۚ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٢١٨﴾ ﴾

## مانـای وشـە بە وشـەی ئایەتەکـان

((- خـوای پـەروەردگار بـە بـڕواداران دەفـەرموێ: - جـەنگتان لەسـەر نووسـراوە، هەرچەنـدە حەزی لێناکـەن، ڕەنگە شـتێکیشـتان نەوێو بۆشـتان چاك بێ، وە ڕەنگە حەز لە شتێك بکەنو بۆشـتان خراپ بێ، وە خوا دەزانێو ئێوە نازانن ﴿٢١٦﴾ لەبارەی مانگی حەرامەوە لێت دەپرسن جەنگ تێداکردنی چۆنە ؟ بڵێ: جەنـگ تێـداکردنی گەورەیە، بەڵام ڕێگرییـکردن لە ڕێبازی خواو، بێبـڕوایی بە خواو، ڕێگرییکـردن لـە مزگەوتی حەرامو لێـوەدەرنانی خەڵکەکەی، لـەلای خـوا گـەورەترە، وە ئـازاردان (ی بڕواداران) لە کوشتن زلتـرە، وە بـەردەوام (ئـەی بڕوادارایـنـە!) کافرەکـان جـەنگتان لەگـەڵ دەکـەن، تـاکو ئەگـەر بۆیـان بکـرێ لـە ئایینەکـەتان هەڵتانـبگـێڕنەوە، وە هەرکەسـێك لـە ئێـوە لـە ئایینـەکەی پاشـگەزبێتەوەو بـە کـافریی بمـرێ، ئـەوە ئـەو جۆرە کەسانە لە دنیاو دوارۆژدا کردەوەکانیان هەڵوەشـاونەوە، وە ئەوانـە هـاوەڵانی ئاگرنو بە هەمیشـەیی تێیـدان ﴿٢١٧﴾ بێگومان ئەوانەی بڕوایان هێناوە، وە ئەوانـەی کۆچیان کردووەو، لە ڕێبـازی خـوادا تێکۆشـاون، ئا ئەوانە بەهیـوای بەزەیـی خـوان، وە خـواش لێبوردەیـی بە بەزەییـە ﴿٢١٨﴾ )).

## شیکـردنەوەی هـەندێـك لە وشـەکان

(**كُتِبَ**): (أي أُوجِبَ وَفُرِضَ)، وشـەی: (كُـتِـبَ) واتـە: پێویـست کـراوە، هەرچـەندە لە ئەسـڵدا بەمانای (نووسراوە)یە، بـەڵام ئـەو نووسـینە لێرەدا مەبەسـت پێـی فـەرز کرانە (وَ وَجْهُ ذَلِكَ أَن الشَّيءَ يُـرَادُ، ثُمَّ يُقَـالُ، ثُمَّ يُكْتَبُ فَالإِرَادَةُ مَبْدَأٌ، وَالكِتَـابَةُ مُنْتَهـىً) هۆی ئـەوەش چـونکە: شـت دەویـسترێ، پاشـان دەگـوترێ: دوایی دەنووسـرێ، کەواتە: ویسـتن سـەرەتایەو نووسـین کۆتایی یە.

(**كُرْهٌ لَّكُمْ**): (أي: مَكْـروهٌ لَكُـم مِـنْ حَيْـثُ الطَّبْـعُ، الكَـرْهُ: المَـشَقَّةُ الّتـي تَنَـالُ الإِنْسَـانَ مِن خَارِجٍ فِيمَا يُحْمَلُ عَلَيهِ بِإِكرَاهٍ، والكُرْهُ: مَا يَنَالُـهُ مِن ذَاتِـهِ وهُـوَ

يَعَافُهُ طَبعَاً أو عَقلاً أوَ شَرْعَاً)، واتە: بە سروشت حەزی لێناكەن‌و پێتان ناخۆشە، وشەی: (كَرْهٌ) بە مانای مەشقەقەتێك دێت لە دەرەوەی توانای ئینسانەوە بێت‌و سەریدا فەرز بكرێ، بەڵام وشەی (كُرْهٌ) بە شتێك دەگوترێ كە ئینسان لە خودی خۆیدا حەزی لێناكات، جا بە سروشت وابێ، یاخود بە عەقڵ، یان بە شەرع ڕەفزی بكات.

(وَعَسَىٰٓ): (طَمَعٌ وترجٍّ، ومَنْ قَالَ أنَّ الطَمَع والرَّجَاءَ لاَ يَصِحُّ مِنَ اللهِ مُخطِئٌ لأنَّ الله تَعَالى إذَا ذكرَ ذَلِكَ فالمَقصُودُ بِهِ هُوَ الإنسَان أن يَطمَع ويَرجو)، وشەی (عَسَى) واتە: ڕەنگە، نزیكە، لەوانەیە، وە ئەوەی دەڵێ: (طمع)و (رجاء) بۆ خوا ناشێن، بەهەڵەداچووە، چونكە خوای بەرز، كە ئەوە دەفەرموێ، مەبەستی پێ مرۆڤە كە تەماع‌و ئومێدی وابێ.

(خَيْرٌ): (الْخَيْرُ: هُوَ كُل مَرْغُوبٌ فِيهِ كَالعَدْلِ والعَقلِ والفَضْلِ والشَّيءِ النَّافِعِ..)، وشەی: (خَيْر) واتە: چاك یان چاكتر، وە هەر شتێكە كە ئینسان حەزی لێبكات‌و ئارەزووی لێبكات، وەك عەدل‌و عەقڵ‌و فەزڵ‌و شتی سوودبەخش...

(شَرٌّ): (الشَرّ: هُوَ كُلُ مَرغُوبٌ عَنهُ وَهُوَ عَكس الخَير مِن كُل وَجهٍ)، وشەی (شَرّ) هەر شتێكە، كە ئینسان ئارەزووی بۆ نەچێ‌و حەزی لێ نەكات‌و پێی باش نەبێ، بە پێچەوانەی (خَیر) لە هەموو لایەكەوە.

(وَصَدٌّ): (الصُّدُودُ والصَّدُّ قَدْ يَكُونُ إنصِرَافاً عَنِ الشَّيءِ وامتِنَاعَاً، نَحو: ﴿ ... يَصُدُّونَ عَنكَ صُدُودًا ﴿٦١﴾ ﴾النساء، وقد يَكُونُ صَرْفَاً وَمنْعَاً، نَحوُ: ﴿ ... بَلْ زُيِّنَ لِلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مَكْرُهُمْ وَصُدُّوا۟ عَنِ ٱلسَّبِيلِ ... ﴿٣٣﴾ ﴾الرعد، وشەی (صَدّ): بە مانای نەكردن‌و لادان دێ، هەروەها بە مانای گێڕانەوە، یان بەرپەرچ دانەوە، دێ.

(**يَرْتَدِدْ**): (الإرْتِدَادُ والرِّدَّةُ: الرُّجُوعُ في الطَّرِيق الَّذي جَاءَ مِنهُ، لَكِنِ الرِّدَّةُ تَخْتَصُّ بالكُفر، أي الرجُوعُ إلى الكُفر)، وشەی: (الإرتدَاد والرِّدَّة) بریتیە لە گەڕانەوە لە ڕێگایەکەوە کە لێیەوە هاتوە، لە هەمان ڕێوە بگەڕێتەوە پاشەوە، بەڵام (رِدَّة) تایبەتە بە کوفر، یان گەڕانەوە بۆ سەر کوفرو بێبڕوایی.

(**حَبِطَتْ**): (وأَصلُ الحَبْطِ مِنَ الحَبَطِ، وَهُوَ أَن تُكثِر الدَابَّةُ أَكلاً حَتَّى يَنتَفِخَ بَطْنُها)، واتە: وشەی (حَبِطَت) لە ڕیشەوە لە (حَبَطْ)ەوە هاتوە، ئەویش ئەوەیە کە ئاژەڵێك لەوەڕی زۆر بخوات، تاکو ورگی دەئاوسێ‌و دوایی وەزعی تێکبچێ، (إذًا: حَبِطَتْ أعمَالُهُم، أي: بَطَلَت وذَهَبَت، وبطُولِهَا: ذِهَاب ثَوابِها وبطُول الأَجْرِ عَلَيْها)، کەواتە: (حَبِطَتْ أعمَالُهُم) یانی: کردەوەکانیان هەڵوەشانەوەو لاچوون، کە دیارە مەبەست لە هەڵوەشانەوەشیان، نەمانی پاداشتیانە لەسەر کردەوەکانیان.

(هَاجَرُواْ): (الْهَجْرُ وَالْهِجْرَانُ: مُفَارَقَةُ الإنسانِ غَيرَهُ، إمّا بالبَدَنِ، أو باللِّسَان، أو بالقَلب، والْمُهَاجَرَةُ في الأصْلِ: مُصارَمَةُ الغَيرِ ومُتَارَكَتُهُ والمَقصُودُ بـ(هَاجَروا) خَرجُوا مِن دَار الكُفرِ إلى دَار الإيمان)، واتە: (هَاجَروا) یانی: کۆچیان کردوە، (الْهَجْرُ وَالْهِجْرَانُ)، واتە: ئەوە کە ئینسان واز لە غەیری خۆی بێنێ‌و بەجێی بهێڵێ، یاخود شوێن، یان خەڵکەکە بەجێ بهێڵێ، جا ئەم بەجێهێشتنە بە لاشە بێ، یان بە زمان، یاخود بە دڵ، وە مەبەست لە (هاجروا) دەرچوونە لە وڵاتی بێبڕوایی بۆ وڵاتی بڕواداریی.

(وَجَٰهَدُواْ): (الْجَهْدُ والْجُهْد: الطَاقَة والمَشَقّة، والْجِهَادَ والْمُجَاهَدَة: اسِتفرَاغُ الوُسْع في مدَافَعَة العَدو)، واتە: (جَاهَدُوا) یانی: تێکۆشاون، وە (الجَهْدُ والجُهْد)، واتە: ماندووبون‌و نارەحەت بوون، وە (جِهَاد و مُجَاهَدَة) ئەوەیە کە ئینسان ئەوپەڕی توانای خۆی لە دژایەتیکردنی دوژمندا بەکاربێنێ، ئەوەش کاتێك دەبێت کە ئینسان ئامادەبێ سەرو ماڵی خۆی لەو ڕێیەدا بەخت بکات.

(يَرْجُونَ): (الرَّجاءُ: ظَنٌّ يَقتَضي حصُول ما فيهِ مَسَرَّةٌ)، واتە: (يَرْجُون) یانی: (يأملون)، بە هیواو بە ئومێدن، وە (رجاء) گومانێكە ئەوە دەخوازێ شتێك پەیدابێ، ئینسان دڵی پێ خۆشبێ.

## هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتەكان

لەبارەی هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم دوو ئایەتەی خوارەوە، كە خوای دادگەر دەفەرموێ: ﴿ يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلشَّهۡرِ ٱلۡحَرَامِ قِتَالٖ فِيهِۖ قُلۡ قِتَالٞ فِيهِ كَبِيرٞۚ وَصَدٌّ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ وَكُفۡرُۢ بِهِۦ وَٱلۡمَسۡجِدِ ٱلۡحَرَامِ وَإِخۡرَاجُ أَهۡلِهِۦ مِنۡهُ أَكۡبَرُ عِندَ ٱللَّهِۚ وَٱلۡفِتۡنَةُ أَكۡبَرُ مِنَ ٱلۡقَتۡلِۗ وَلَا يَزَالُونَ يُقَٰتِلُونَكُمۡ حَتَّىٰ يَرُدُّوكُمۡ عَن دِينِكُمۡ إِنِ ٱسۡتَطَٰعُواْۚ وَمَن يَرۡتَدِدۡ مِنكُمۡ عَن دِينِهِۦ فَيَمُتۡ وَهُوَ كَافِرٞ فَأُوْلَٰٓئِكَ حَبِطَتۡ أَعۡمَٰلُهُمۡ فِي ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِۖ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿٢١٧﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَٱلَّذِينَ هَاجَرُواْ وَجَٰهَدُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ أُوْلَٰٓئِكَ يَرۡجُونَ رَحۡمَتَ ٱللَّهِۚ وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴿٢١٨﴾ ﴾، بەسەرهاتێك هەیە كە هەم نەیسابووریی لە (أسباب النزول)دا هێناویەتی[1]، وە هەم (إبن هشام) لە (السيرة النبوية)ی خۆیدا هێناویەتی[2]، بەم شێوە: {أَخْرَجَ الطَبَرانُ في الكَبير برقم: (١٦٧٠)، والبَيهَقيّ في سُنَنِهِ، وإبن جَرير، وابن أبی حاتم عَن جُندب بن عَبدُالله رَضِيَ اللهُ عَنْهُ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ بَعَثَ رهطاً وَبَعَثَ عَليهِم عَبدالله بن جَحْشٍ فَلقوا إبن الحَضرَمي فَقَتَلُوهُ، وَلَمْ يَدرُوا أنَّ ذَلِكَ اليَوْمَ مِن رَجَب أو مِن جَمَادٍ، فَقَالَ المُشرِكُونَ لِلمُسلمينَ: قَتَلْتُم في الشَهْرِ الحَرَّام، فَأَنْزَلَ اللهُ هَذِهِ الآيةَ ﴿ يَسۡـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلشَّهۡرِ ٱلۡحَرَامِ قِتَالٖ فِيهِ ... ﴾، فَقَالَ بَعضُهُم: إنْ لَمْ يَكُونُوا أصَابُوا وِزراً فَلَيسَ لَهُمْ أَجرٌ، فَأَنْزَلَ اللهُ:

---
١) بڕوانە: لاپەڕە: (٤٥ تا ٤٨).

٢) بڕوانە: ج: (٢)، لاپەڕە: (٣٢٤ تا ٣٢٧).

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَٱلَّذِينَ هَاجَرُواْ ... ﴾}، واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ کۆمەڵێکی ناردن لە کۆچکەران وە عەبدوڵڵای کوڕی جەحشی کردە فەرماندەیان، ناردنی بەرەو مەککە، بەو ڕێیەدا کە ڕۆیشتن تووشی (إبن الحضرمي) بوون {دیارە سەر قافڵەی کاروانەکە بووەو چەند کەسێکی دیکەشی لەگەڵ دا بوون}، دیارە (إبن الحضرمي)یان کوشتو دوو کەسیشیان لێ بەدیل گرتن، بەڵام نەیانزانی ئەو ڕۆژە ئایا کۆتا ڕۆژی جەمادی دووەمە، یان یەکەم ڕۆژی ڕەجەبە، بت پەرستەکان بە مسوڵمانانیان گوت: ئێوە لە مانگی حەرامدا خەڵکتان کوشتوە، لە حاڵێکدا کە شەڕکردن لە مانگی حەرام {واتە: لە (رَجَب، ذُوالقَعِدَة، ذُو الحِجَّةَ، مُحَرَّم)}دا قەدەغەیە، کەواتە: ئێوە گوناهبارن! بەو بۆنەیەوە خوا ئەو ئایەتەی ناردە خوارێ کە دوایی ماناکەی دەردەکەوێ چۆنە، ئەوە بەنسبەت ئایەتی: ﴿ يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلشَّهْرِ ٱلْحَرَامِ قِتَالٍ فِيهِ ... ﴾.

وە بەنسبەت ئایەتی: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَٱلَّذِينَ هَاجَرُواْ ... ﴾ دەڵێ: هەندێ لە مسوڵمانان گوتیان: جا خۆ ئەگەر گوناهباریش نەبووبن (واتە: عەبدوڵڵای کوڕی جەحش و مەفرەزەکەی) پاداشتیان هەر نیە، ئیدی خوا ئەم ئایەتەی دیکەشی ناردە خوارێ، کە باسی ئەوە دەکات کە ئەوانەی ئیمانیان هەیەو کۆچ دەکەن و جیهاد دەکەن لە پێناوی خوادا، ئەوانە بەئومێدی بەزەیی خوان، وە ڕەحمەتو بەزەیی خوای بەخشەر وەدەست دەهێنن.

## مانای گشتی ئایەتەکان

خوای تاک و پاک ڕوو لە هاوەڵانی بەڕێزی پێغەمبەر ﷺ دەکات بە پلەی یەکەم، وە لە دوای وانیشەوە ڕوو لە بڕواداران دەکات، هەر بۆیەش تاکو هەمیشە دواندنەکانی قورئان گشتگیربن، خوا ﷻ باسی هاوەڵان ناکات و نافەرموێ: (كُتِبَ عَلَيكُم القِتَالُ أَيُّهَا الأَصْحَاب)، یان (أَيُّهَا الصَحَابَة) بەڵكو ڕوو لە ئیمانداران دەکات بەگشتی، کە هەم هاوەڵانی بەڕێز دەگرێتەوە لە پێش

هەمووواندا، وە هەم هەموو جیلەکانی دیکەی مسولْمانانیش دەگرێتەوە، تاکو مسولْمانێك لەسەر زەوی بمێنێ، وە دەفەرموێ: ﴿ كُتِبَ عَلَيْكُمُ ٱلْقِتَالُ وَهُوَ كُرْهٌ لَّكُمْ ﴾، جەنگکردنتان لەسەر پێویست کراوە، هەرچەندە حەزیشی لێناکەن، پێشتان ناخۆشە، واتە: خوا ﷻ لەلایەکەوە بە مسولْمانان ڕادەگەیەنێ، کە جەنگکردنیان لەسەر پێویست کراوەو، لە لایەکی دیکەشەوە ئاگاداریان دەکاتەوە کە خوا ﷻ هەموو شتێك دەزانێ و زانای پەنهان و ئاشکرایە، دەزانێ کە حەز لە جەنگکردن ناکەن، چونکە بریندار بوون و کۆچکردن و کوژران و ئەو شتانەی تێدایە، پاشان دەفەرموێ: ﴿ وَعَسَىٰٓ أَن تَكْرَهُوا۟ شَيْـًٔا وَهُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ ﴾، بەلاّم زۆر نزیکە شتێکتان حەز لێ نەبێ و کەیفتان پێی نەیەت و بۆ ئێوەش چاك بێ، یاخود بۆ ئێوەش چاکتربێ، لەو شتەی کە حەزتان لێیەتی، ئنجا دەفەرموێ: ﴿ وَعَسَىٰٓ أَن تُحِبُّوا۟ شَيْـًٔا وَهُوَ شَرٌّ لَّكُمْ ﴾، وە زۆر نزیکە گەلێك جار حەز لە شتێك بکەن، لە حالێکدا کە بۆشتان خراپە، یاخود بۆشتان خراپترە لەو شتەی حەزی لێ ناکەن، لە کۆتایی ئایەتەکەدا دەفەرموێ: ﴿ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴾، وە خوا دەزانێ، بەلاّم ئێوە نازانن، یانی: خوا دەزانێ چی بۆ ئێوە چاکە، بۆیە لەسەرتان پێویست دەکات، بەلاّم ئێوە نازانن چی بۆ ئێوە چاکە، بۆیە زۆرجار ئەو شتانەی کە خوا پێی چاکن حەزیان لێناکەن، هەڵبەتە ئەوەش وەك دوایی باسی دەکەین، ئەوە دەگەیەنێ کە خوای پەروەردگار دەیەوێ ئیمانداران ڕابێنێ لەسەر ئەوە کە هەرچی خوای کاربەجێ، وەك ئەرك دەیخاتە سەرشانیان، بابزانن و دڵنیابن کە خێری تێدایە بۆ وان، وە ئەو خوایەی کە دەیپەرستن و ئەو ئەرکانەیان دەخاتە سەرشان، لەوان باشتر بەرژەوەندیی و خێرو قازانجی دنیاو دوارۆژیان دەزانێ، ئنجا دەفەرموێ: ﴿ يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلشَّهْرِ ٱلْحَرَامِ قِتَالٍ فِيهِ ﴾، دیارە ئەو پرسیارە لە پێغەمبەر ﷺ کراوە، ئایا بتپەرستەکان لێیان کردوە، یاخود مسولْمانان؟ هەرکامیان یەکسانە، واتە: پرسیارت لێدەکەن دەربارەی جەنگکردن لە مانگی حەرامدا، چۆنە؟ ﴿ قُلْ قِتَالٌ فِيهِ كَبِيرٌ ﴾، پێیان بڵێ: جەنگکردن لە مانگی حەرامدا {لەو مانگانەی

کە جەنگیان تێدا حەرام کراوە، کە بریتین لە مانگەکانی: (رَجَب، ذُوالقَعدَة، ذُو الحِجَة، مُحَرّم)} شتێکی گەورەیە، واتە: گوناهێکی گەورەیە، بەڵام ﴿ وَصَدٌّ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ وَكُفۡرُۢ بِهِۦ وَٱلۡمَسۡجِدِ ٱلۡحَرَامِ وَإِخۡرَاجُ أَهۡلِهِۦ مِنۡهُ أَكۡبَرُ عِندَ ٱللَّهِ ﴾، {ئەگەر جەنگکردن لە مانگی حەرامدا گەورەیە، کە مسوڵمانان بەهەڵە کردوویانە، وە مادام بەهەڵە کردوویانە گوناهباریش نابن، ئەوە کافرەکان لە بەرانبەردا چوار گوناهی گەورەیان هەیە، کە هەرکامیان گەورەترن لەو گوناهە}:

١- ﴿ وَصَدٌّ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ ﴾: گێڕانەوەی خەڵك و هەڵگێڕانەوەی خەڵك لەرێی خوا، یاخود کۆسپ خستنە بەردەمیان، بۆ ئەوەی کە بەرەو خواو بەرەو دینی خوا نەچن.

٢- ﴿ وَكُفۡرُۢ بِهِۦ ﴾: وە کوفرکردن بە خواو بێبڕوایی بەرانبەر خوا.

٣- ﴿ وَٱلۡمَسۡجِدِ ٱلۡحَرَامِ ﴾: وە گێڕانەوەی خەڵك لە مزگەوتی حەرام.

٤- ﴿ وَإِخۡرَاجُ أَهۡلِهِۦ مِنۡهُ ﴾: وە وەدەرنانیان لە مزگەوتی حەرام و لەسەر زەمینی حەرام، کە کاتی خۆی کافرەکانی قوڕەیش مسوڵمانانیان دەرکرد لەوێ ﴿ أَكۡبَرُ عِندَ ٱللَّهِ ﴾ ئەو چوار شتە گەورەترن لەلای خوا لە جەنگکردن لە مانگە حەرامەکاندا ﴿ وَٱلۡفِتۡنَةُ أَكۡبَرُ مِنَ ٱلۡقَتۡلِ ﴾، وە ئازاردانی مسوڵمانان بۆ ئەوەی لە دین هەڵیانگێڕنەوەو، ئەشکەنجە دانیان گەورەترە لە کوشتن، واتە: گەورەترە لەوەی کە بیانکوژن، یاخود گەورەترە لەو کوشتنەی (إبن الحضرمی) لەلایەنی ئەو مەفرەزەیەی کە پێغەمبەر ﷺ ناردوویەتی، ﴿ وَلَا يَزَالُونَ يُقَٰتِلُونَكُمۡ حَتَّىٰ يَرُدُّوكُمۡ عَن دِينِكُمۡ إِنِ ٱسۡتَطَٰعُواْ ﴾، ئنجا خوای پەروەردگار دەیەوێ ئیمانداران لە ڕاستییەکی گەورە حاڵی بکات، کە ئایا هەڵوێستی ئەهلی کوفر لە بەرانبەریاندا چۆنە؟ ئاگاداریان دەکاتەوەو دەفەرموێ: ئەوان بەردەوام دەبن لەسەر جەنگکردن لەگەڵتاندا، هەتا لە ئایینتان هەڵتان دەگێڕنەوە، ئەگەر

بۆیان بکرێ، واتە: ئەوانە دەستبەرداری شەڕکردن لە دژی ئێوە نابن، هەتا وەك خۆیان کافرتان دەکەنەوە، ئنجا دەفەرموێ: ﴿ وَمَن يَرْتَدِدْ مِنكُمْ عَن دِينِهِۦ فَيَمُتْ وَهُوَ كَافِرٌ فَأُوْلَٰٓئِكَ حَبِطَتْ أَعْمَٰلُهُمْ فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْءَاخِرَةِ ﴾، وە هەر کەسێك لەئێوە لە ئایینەکەی پاشگەزبێتەوەو بە کافری بمرێ، ئەوە کردەوەکانی لە دنیاو دواڕۆژدا هەڵوەشاونەوە، واتە: نە کەڵێنی دنیای بۆ دەگرن نە هی دواڕۆژ، مادام بە کافری بمرێ {دیارە دوایی باسی دەکەین، کە زانایان دەربارەی کەسێك کە مسوڵمانەو لە ئیسلام هەڵدەگەڕێتەوە، بەڵام دوایی جارێکی دیکە دێتەوە نێو ئیسلام، ئایا ئەو کردەوانەی کە پێش هەڵگەڕانەوەی کردوونی، ماون یا نەماون؟ زانایان لەوەدا ڕاجیاییان هەیە} ﴿ وَأُوْلَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِ ۖ هُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴾، ئا ئەوانە هاوەڵی ئاگرن، بە هەمیشەیی تێیدا دەمێننەوە، یاخود خاوەنی ئاگرن، چونکە (أصحاب) کۆی (صاحب)ە، (صاحب)یش هەم بەمانای هاوەڵ دێ‌و هەم بەمانای خاوەنیش دێ، واتە: ئەگەر لە دواڕۆژدا ئەوانە شتێك هەبێت بیکەنە موڵکی خۆیان، بریتیە لە دۆزەخ، یاخود ئەگەر ڕەفیقێك هەبێ، هەمیشە لەگەڵیان بێت‌و لێیان جیانەبێتەوە، بریتیە لە دۆزەخ، ئنجا لە کۆتاییدا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَٱلَّذِينَ هَاجَرُواْ وَجَٰهَدُواْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ أُوْلَٰٓئِكَ يَرْجُونَ رَحْمَتَ ٱللَّهِ ۚ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴾، ئەوەش وەك گوتم بۆ وەڵامی ئەو ئیشکالەیە کە گوتیان: ئەوانەی لە مانگی حەرامدا شتیان کردوە، دەبێ گوناهیان چۆن بێ‌و خێریان چۆن بێ؟ خوا ﷻ دەفەرموێ: بێگومان ئەوانەی ئیمانیان هێناوە، وە ئەوانەی کە کۆچیان کردوەو تێکۆشاون لەڕێی خوادا، ئا ئەوانە بەئومێدی بەزەیی خوان، وە خوا لێبوردەیی بەبەزەییە، واتە ئەوانە جێی خۆیەتی کە بەتەمای ڕەحمەت‌و بەزەیی خوای بەخشندە بن، چونکە ڕەحمەتی خوا دەبێت کەسێك بە تەمای بێت، کە کردەوەی هەن‌و، هەر کەس بەبێ کردەوە هەروا بە خەیاڵ پڵاو بەتەمای ڕەحمەتی خوا بێت، ئەوە لەڕاستیدا هەڵەیە، چونکە: (کەس بە خەیاڵ نەبووە بە ماڵ).

# چەنـد مەسـەلەیەکـی گرنـگ

**مەسـەلەی یەکەم:** دەربارەی ئەو ڕستەیە، کە دەفەرموێ: ﴿ كُتِبَ عَلَيْكُمُ الْقِتَالُ وَهُوَ كُرْهٌ لَّكُمْ ﴾، واتـە: جەنگـکردنتان لەسـەر پێویـستکراوەو جـەنگو جیهاد لەسـەر مـسوڵمانان فـەرزە، چـونکە هـەق پێویـستی بـەهێز هەیـە بـۆ ئـەوەی پـشتگیریی بکـاتو بیپـارێزێ، دیـارە هەمیـشە هـەق بۆخـۆی خـۆی سـاغ کردۆتـەوە، بـەڵام دوای ئـەوەی دەبێتـە قـەوارە، هەقێـك کـە لـە قەوارەیەکـی سیاسیداو لـە کۆمەڵگـاو دەوڵەتێکـدا بەرجەسـتە دەبێـت، دەبـێ هێزێـك هـەبێ بۆی ببـێ بە شوورەو قەڵغانو سوپەرو بیپـارێزێ.

کەواتــە:

لێرەدا دوو مەسەلە هەن نابێ لێمـان تێکەڵ بن:

أ- هەق ئیسلامە – کە لێرە مەبەستمان پێـی بـۆ چەسـپاندنی چەکـی لەسـەر هێز نەکەوتوەو ڕێگاش نادات بەزەبری هێـز بسەپێنـرێ.

ب- بەڵام دوای ئەوەی ئەو هەقە کەسانێك بـڕوای پـێدێننو شـوێنی دەکـەونو لە قەوارەیەکی سیاسیدا بەرجەستەی دەکەن، بێگومان پێویـستی بـە هێـز هەیە کە بیپارێزێو بەهێزو پێـزەوە ڕایگرێ.

**مەسـەلەی دووەم:** ئەو ڕستـەیە، کە دەفـەرموێ: ﴿ وَهُوَ كُرْهٌ لَّكُمْ ﴾، واتـە: پێتـان ناخۆشـەو حـەزی لێناکـەن، ئەمـە ئـەوەی لێوەردەگیـرێ، کـە ئیـسلام دان بـە سروشتو فیطـرەتی ئینسانەکان دادێنێ، خوا دەزانێ کە ئینسان پێی ناخۆشـە بـچێتە شـەڕێو برینـداربێو بکـوژرێو سـەقەت بێـت، ئینـسان بـە سروشـت ناخۆشیی پێناخۆشە، بەڵام ئەدی چ شتێك وا لـە مـسوڵمانان دەکـات جیهادیـان زۆر پـێ خۆشـبێ؟ دیارە پاداشـتی خـوا ﷻ وایـان لێـدەکاتو دەزانـن کـە خـوا فـەرزی کـردوەو لـە بەرانبەریـدا بەهەشـتیان دەسـتدەکەوێو، دەزانـن کـە خـوا لێیان ڕازی دەبێتو، دەزانـن کـە بـەوە نـەبێ نابنـە مـسوڵمانی بـاش، ئـا ئەوانـە

وایان لێدەکات... ئەگەرنا لە ئەسڵدا، ئەگەر لەبەر خواو لەبەر قیامەتو لەبەر پاداشت نەبێت، ئینسان ئەگەر تووشی میزاج تێکچوون بووبێ لە سروشتیدا، ئەگەرنا کەیفی بەوە نایەت کە بکوژرێ، یان سەقەت بێت، ئنجا ئەمە ئەوەی لێوەردەگیرێ کە ئیسلام دان بە سروشتی ئینسان دادێنێ، وەك خۆی کە هەیە، بەڵام پەروەردەی دەکاتو ڕای دەهێنێو مەشقی پێدەکات، کە ملی پێ کەچ بکات بۆ یاساکانی شەرع.

**مەسەلەی سێیەم:** ئەوە کە دەفەرموێ: ﴿ وَعَسَىٰٓ أَن تَكۡرَهُواْ شَيۡـًٔا وَهُوَ خَيۡرٞ لَّكُمۡۖ وَعَسَىٰٓ أَن تُحِبُّواْ شَيۡـًٔا وَهُوَ شَرّٞ لَّكُمۡ ﴾، ئەوەی لێوەردەگیرێ، کە مسوڵمان نابێت سەرکێڵو ڕواڵەتیی بێت، هەر کە خۆشییەکی بینی، یەکسەر بڵێ: تازە بەمراد گەیشتم، یان کە شتێکی بینی بەڕواڵەت ناخۆشبوو، بڵێ: تازە من بێ مراد بووم، بەڵکو زۆرجار شتێك بە ڕواڵەت خۆشە، بەڵام دیوە پەنهانەکەی زۆر خراپە، بۆ وێنە: کابرا کە دزیی دەکات، یان قوماری دەکات، یان ماڵێکی حەرامی دەستدەکەوێ، یان خراپەیەك دەکات، یان شەراب دەخواتەوە، بێگومان لەززەتێکی هەیە، بەڵام باجەکەی زۆر گەورەیەو سەرەنجامەکەی زۆر خراپە، هەروەها جاری واش هەیە مرۆڤ هەڵدەستێ بۆ شەونوێژکردن، یان بە سەرما نوێژێ دەکات، بە گەرما بەڕۆژوو دەبێت، یاخود ماڵی خۆی دەبەخشێ، بە ڕواڵەت ناخۆشە، بەڵام خێرو پاداشتێکی گەورەو بەرژەوەندییەکی گەورەی لە پشتەوەیە، کەواتە: مسوڵمان قەت نابێ ڕواڵەت بینو سەرکێڵ بێت، بەڵکو دەبێت دیوی نێوەوەی شتەکانیش ببینێ، وەك خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ لِّكَيۡلَا تَأۡسَوۡاْ عَلَىٰ مَا فَاتَكُمۡ وَلَا تَفۡرَحُواْ بِمَآ ءَاتَىٰكُمۡۗ وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ كُلَّ مُخۡتَالٖ فَخُورٍ ٢٣ ﴾ الحديد، خوا ڕاستییەك ڕوون دەکاتەوە، دوایی دەفەرموێ: بۆیە ئەوەمان بۆ ڕوونکردوونەوە تاکو ئەگەر شتێکتان لەدەستچوو زۆر خەمی لێنەخۆن، وە ئەگەر شتێکتان هاتە دەست زۆر پێی دڵخۆش نەبن، مسوڵمان پێویستە نە لە کاتی هات داو نە لە کاتی نەهات دا، زۆر بە هەڵپە نەکەوێو

سەنگین بێ‌و هاوسەنگیی خۆی وا بە ئاسانی تێکنەدات، وەك كوردەواریی خۆمان دەڵێن: (ماڵی مێروو بە دڵۆپە ئاوێكی وێران دەبێت) یان (فلان كەس بە بستە ئاوێك دەكەوێتە مەلە)، بەلام مسوڵمان نابێ وابێ.

**مەسەلەی چوارەم:** كە دەفەرموێ: ﴿ وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ وَأَنتُمۡ لَا تَعۡلَمُونَ ﴾، خوا دەزانێ‌و ئێوە نایزانن، هەر كەسێك بەڕاستی بڕوای بە خوا بێت، وە هەر كەسێك بەڕاستی بڕوای بە شەریعەت‌و دینی خوا بێت، ئەو حەقیقەتە دەزانێت كە خوا دەزانێ‌و ئەو نازانێ، مرۆڤ ئەگەر هەر چ بڕ خوا بناسێ، ئەگەر زۆریش نا، هەر كەمێكیش بیناسێ، دەزانێ كە خوا لەو زاناترە، كەواتە: هەر شتێك خوا پێویستی كردوەو هەر ڕێیەك پێشانی تۆی داوەو بۆتۆی داناوە، تۆ دەبێ دڵنیابی كە ئەوە چاكە بۆتۆ، وە هەرچی خوا لێی قەدەغەكردووی، دەبێ بزانی‌و دڵنیابی كە ئەوە بۆ تۆ خراپە، بۆیە خوا لێی قەدەغەكردووی، جا لێرەدا مسوڵمان زۆر بە ئاسوودەیی زۆر بە دڵ ئارامیی، هەرچی خوا لەسەری پێویست كردوە، جێبەجێی دەكات‌و دڵنیاشە كە قازانجی تێدایە، وە هەرچی كە خوا لێی قەدەغەكردوە، خۆی لێ دەپارێزێ‌و دڵنیاشە كە بە زیانی تەواو دەبێ، بۆیە خوا قەدەغەی كردوە، بە كورتیی: مسوڵمان دەبێت خۆی بە ڕووباری شەرعدا بدات، وەك كۆلكەدارێك ڕووباری شەرع بۆ كوێی دەبات، بیبات، با دڵنیا بێت كە قازانجیەتی.

**مەسەلەی پێنجەم:** دەربارەی ئەو ڕستەیە، كە دەفەرموێ: ﴿ يَسۡـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلشَّهۡرِ ٱلۡحَرَامِ قِتَالٖ فِيهِۖ قُلۡ قِتَالٞ فِيهِ كَبِيرٞ ﴾، پرسیارت لێدەكەن دەربارەی مانگی حەڕام جەنگ تێداكردنی چۆنە؟ بڵێ: جەنگ تێداكردنی گەورەیە، واتە: گوناهێكی گەورەیە، لێرەدا زانایان كەوتوونەتە مشتومڕەوە، كە ئایا ئێستا جەنگكردن لەو چوار مانگەدا (رَجَب، ذُو القَعِدَة، ذُو الحِجَة، مُحَرّم)، هەر قەدەغەیە یاخود نەسخ كراوەتەوە؟! جا ئێمە لە دەرسەكانی ڕابردوودا باسمان كردوە كە هیچ ئایەتێك نیە لە قورئاندا بخوێندرێتەوەو كاری پێنەكرێ، واتە: (منسوخ) بێت، شتی وا نیە لە قورئاندا، وە هەموو ئەو ئایەتانەی كە پێیاندا

تێپەڕین باسمان كردوون، وە ئەوە كە لێرەدا خوا دەفەرموێ: ﴿ قُلْ قِتَالٌ فِيهِ كَبِيرٌ ﴾، جەنگكردن لەو مانگە حەرامانەدا گەورەیە، توێژەرەوانی قورئان لەوەدا ئیشكالیان بۆ دروست بووە، كە پێغەمبەر ﷺ زۆرجار جەنگی كردوەو نەشی پرسیوە، داخۆ مانگی حەرامە یان نا ؟ كەواتە: دیارە ئەو ئایەتە (نَسْخ) بۆتەوە ! چونكە لێرەدا خوا دەفەرموێ: جەنگكردن لە مانگە حەرامەكاندا گوناهێكی گەورەیە، لەولاشەوە پێغەمبەریش ﷺ، وە هاوەڵانی بەرێزیشی لە مانگە حەرامەكاندا شەڕیان كردوە !! وەڵامەكەی ئەوەیە كە هەموو ئەو جەنگانەی پێغەمبەر ﷺ كردوونی، هەموویان جەنگی بەسەردا سەپێنراو بوون‌و جەنگی دیفاعیی بوون‌و هیچیان جەنگی ئیبتیدائیی نەبوون، واتە: پێغەمبەر ﷺ دەست پێشخەر نەبووە، هەتاكو بپرسێ: ئەرێ ئەم مانگە حەرامە، یان حەلاڵە؟ بەڵكو شەڕەكە بەسەریدا سەپاوەو شەڕیش كە بەری دەرگای پێگرتی، تۆ ناپرسی‌و ناڵێی: ئێستا مانگی حەرامەو شەڕ ناكەم، تازە شەڕەكە بەری دەرگای پێگرتووی، دەبێ قۆڵی لێ هەڵبكەی، شەڕێك كە هەڵبژاردنی بەدەستی تۆ بێ‌و دەستپێكردنی بەدەست تۆ بێ، لێی بەرپرسی داخۆ بیكەی یان نەیكەی؟ بەڵام شەڕ كە بەری دەرگای پێگرتی، تازە لە حوكمەكەی ناپرسێ، داخۆ چاكە یان نا ؟ تازە لەسەرت پێویست بووە، زانایانیش دەڵێن: (القِتال الإبتدائي)مان هەیەو (القِتال الدفاعي)یشمان هەیە، (القِتال الإبتدائي): ئەوەیە كە تۆ بۆخۆت دەستپێشخەر دەبی‌و دەستیپێدەكەی، وە پێشی دەڵێن: جەنگی هێرشبەرانە (القِتال الهجومي).

(القِتال الدفاعي)یش: ئەوەیە كە بەرگریی لەخۆت دەكەی‌و شەڕ بەری دەرگای پێ گرتووی، وە جەنگەكانی پێغەمبەر ﷺ هەموویان لەو جۆرە بوون، پاشان ئەگەر تەماشای زۆر ئایەتان بكەین، بۆ وێنە: ئایەتی (٢)ی سووڕەتی (المائدة) خوای پەروەردگار قەدەغەبوونی جەنگ لە مانگە حەرامەكاندا، ڕادەگەیەنێ، دەفەرموێ: ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تُحِلُّوا شَعَائِرَ اللَّهِ

وَلَا ٱلشَّهۡرَ ٱلۡحَرَامَ وَلَا ٱلۡهَدۡيَ وَلَا ٱلۡقَلَٰٓئِدَ وَلَآ ءَآمِّينَ ٱلۡبَيۡتَ ٱلۡحَرَامَ ...﴿٢﴾ ﴾ المائدة ،
واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! درووشمەكان حەڵاڵ مەكەن (واتە: سنوور شكێنییان تێدا مەكەن) هەروەها مانگە حەرامەكان، وە ئەو قوربانییانەی كە دەهێنرێن، {قوربانیی با كافریش بیهێنێ، نابێ دەستدرێژیی بكەیە سەر} وە ئەو ئاژەڵانەی كە گەردن بەندیان لەمل دەكرێ، (ئەوانەش دیسان دەستدرێژییان مەكەنە سەر) وە ئەوانەی بەرەو ماڵی حەرام دێن (كە حەج بكەن، یان عومرە بكەن، با كافریش بن نابێ دەستیان بێننە ڕێ)، تەماشا دەكەین خوای پەروەردگار مانگی حەرامی لە ڕیزی ئەو دروشمانەدا داناوە كە دەبێ ئینسانی مسوڵمان خۆی لە شكاندنیان بپارێزێ.

هەروەها لە ئایەتی (٩٧)ی سووڕەتی (المائدة)دا دەفەرمووێ: ﴿ جَعَلَ ٱللَّهُ ٱلۡكَعۡبَةَ ٱلۡبَيۡتَ ٱلۡحَرَامَ قِيَٰمٗا لِّلنَّاسِ وَٱلشَّهۡرَ ٱلۡحَرَامَ وَٱلۡهَدۡيَ وَٱلۡقَلَٰٓئِدَ ...﴿٩٧﴾ ﴾ ، لێرەشدا دیسان خوای پەروەردگار مانگی حەرامی لە ڕیزی كەعبەو لە ڕیزی (ٱلۡهَدۡيَ وَٱلۡقَلَٰٓئِدَ )دا هێناوە، كەواتە ڕێزلێگرتنی مانگە جەنگ تێدا قەدەغەكراوەكان، كە بریتین لە: (رَجَب، ذُو القَعِدةَ، ذُو الحِجَة، مُحَرّم) ڕاستییەكی شەرعییو چەسپاوەو، ئەو حوكمە نەسخ نەبۆتەوەو هەر لەجێی خۆیەتی، ئنجا جێی سەرنج ئەوەیە كە خوا ﷻ دەفەرمویٚ: ﴿ قُلۡ قِتَالٞ فِيهِ كَبِيرٞ ﴾ ، وە نەیفەرموە: (قُل القِتَالِ فِيهِ كَبِيُر) ئەمەش یانی: جۆرە جەنگێكی تایبەت، كە بریتیە لە: جەنگی دەستپێشخەرانە، جەنگی ئیبتیدائی، ئەو جۆرە جەنگەیە كە گوناهێكی گەورەیە، نەیفەرموە: (قُل القِتَالِ فِيهِ كَبِيُر) هەموو جەنگێك تێیدا قەدەغەیە، واتە: جینسی قیتالی نەفەرمووە، بەڵكو جۆرێك لە جەنگی فەرمووە، ئەویش ئەو جەنگەیە كە مسوڵمانان دەستپێشخەریی تێدا بكەنو دەستدرێژی بكەنە سەر خەڵكی دیكە، كە حەرامە.

**مەسەلەی شەشەم:** خوا ﷻ چوار گوناهی گەورەی كافرەكانی هێناوەو دەفەرموێ: مسولمانان نەیانزانیوە، كە ئەوە مانگی حەرامەو، ئەگەر زانیبایان مانگی حەرامە، دیارە گوناهێكی گەورە بوو دەستپێشخەریی تێدا بكەن، هەرچەندە ئەو جەنگەی هاوەڵان‌و جەنگی بەدریش، كە بەڕواڵەت مسولمانان تێیاندا دەستپێشخەربوونە، لەڕاستیدا وانیە، چونكە ئەوان بەرگریی یان لە قەوارە سیاسییە ساوایە هەڕەشە لێكراوەكەی خۆیان‌و لە ماڵ‌و حاڵ‌و خانووبەرەی زەوتكراوو بە پێ بەجێ هێڵراوی خۆیان دەكردو، جەنگەكەیان دیفاعییانە بوو!، پاشان ئەوان نەیانزانیوە كە جەنگەكەیان كەوتۆتە ئەو ڕۆژەوەو لە ئیشكالدا بوون، بەڵام كافرەكان خۆ دەزانن‌و بەرچاو ڕوونانە چوار گوناهانیش دەكەن: ﴿ وَصَدٌّ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ وَكُفۡرُۢ بِهِۦ وَٱلۡمَسۡجِدِ ٱلۡحَرَامِ وَإِخۡرَاجُ أَهۡلِهِۦ مِنۡهُ أَكۡبَرُ عِندَ ٱللَّهِ ﴾ كە بریتین لە :

**یەكەم:** خەڵك دەگێڕنەوە لەوەی كە ئیمان بێنن‌و بێتە نێو ئیسلامەوە.

**دووەم** : كوفر بە خوا دەكەن.

**سێیەم:** خەڵك دەگێڕنەوە لە مزگەوتی حەرام، ئەوەتا مسولمانان دەگێڕنەوەو ناهێڵن بچنە حەرەم‌و حەج‌و عومرە بكەن.

**چوارەم:** مسولمانان وەدەر دەنێن لە مزگەوتی حەرام‌و لە ئەرزی حەرام، كە چەند ساڵێك لەمەوبەر كردیان - كاتێك وەدەریان بەرەو (یثرب) -.

**مەسەلەی حەوتەم:** دەربارەی ئەو ڕستەیە، كە دەفەرموێ: ﴿ وَٱلۡفِتۡنَةُ أَكۡبَرُ مِنَ ٱلۡقَتۡلِ ﴾، واتە: ئازاردانی مسولمانان بۆ ئەوەی لە دینیان هەڵیانگێڕنەوە، گەورەترە لە كوشتنیان، یاخود گەورەترە لەوەی كە مسولمانان كافرێك بەدەستیان كوژراوە، دەبێت ئەوانە هەموویان بە تەرازووی خوای دادگەر هەڵسەنگێنرێن.

**مەسەلەی هەشتەم:** دەربارەی ئەو ڕستەیە، کە دەفەرموێ: ﴿ وَلَا يَزَالُونَ يُقَٰتِلُونَكُمۡ حَتَّىٰ يَرُدُّوكُمۡ عَن دِينِكُمۡ إِنِ ٱسۡتَطَٰعُواْ ﴾، وە کافرەکان بەردەوام لەگەڵتان دەجەنگن تاکو، ئەگەر بتوانن لە دینتان هەڵتانگێڕنەوە، هەتا ئەو کاتە لە دژایەتیو جەنگ لە دژکردنتان بەردەوام دەبن، کەواتە: دەبێ مسوڵمان دڵنیابێ کە ئەهلی کوفر لە مسوڵمانان ڕازی نابن، بەکەمتر لە کافرکردنیانو، بە کەمتر لە هەڵگێڕانەوەیان، جا ڕەنگە یەکێك بڵێ: کوا خۆ ئەگەر کابرا تەسلیمیان بووو خۆی بە دەستەوەدان، لێی ڕازی دەبن ! دەڵێین: هەرکات تەسلیمیان بوو، مانای وایە بەشی بە ئیسلامەوە نامێنێ، بۆیەش بووە لێی ڕازی دەبن، لە شوێنی دیکەش لە سووڕەتی (البقرة)دا فەرموویەتی: ﴿ وَلَن تَرۡضَىٰ عَنكَ ٱلۡيَهُودُ وَلَا ٱلنَّصَٰرَىٰ حَتَّىٰ تَتَّبِعَ مِلَّتَهُمۡۗ ...﴿١٢٠﴾ ﴾، بێگومان جوولەکەو نەصرانییەکان لێتان ڕازی نابن، هەتا بە دوای ڕێبازو ئایینی ئەوان نەکەون.

**مەسەلەی نۆیەم:** ﴿ وَمَن يَرۡتَدِدۡ مِنكُمۡ عَن دِينِهِۦ فَيَمُتۡ وَهُوَ كَافِرٞ فَأُوْلَٰٓئِكَ حَبِطَتۡ أَعۡمَٰلُهُمۡ فِي ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِۖ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴾ ئەوە زۆر ڕوونە کە دەفەرموێ: هەرکەسێك لە ئێوە لە دینەکەی هەڵگەڕێتەوە بە کافریش بمرێت، کردەوەکانی هەموویان هەڵوەشاونەوە، هەرچی کردوویەتی، نوێژو زەکاتو طاعەتو ... هتد، هەرچی کردوویەتی هەمووی هەڵدەوەشێتەوە، نەکەلێنی دنیای بۆ دەگرێ، نە هی دواڕۆژی، وە سەربارەش دەبێتە خاوەنو هاوەڵی ئاگر، لێرەدا زانایان بوونە دوو بەش[1]:

هەندێکیان دەڵێن: ئەگەر مرۆڤ هەڵگەڕایەوە، بەلام بە کافریی نەمردو دوای هەڵگەڕانەوەکەی دووبارە جارێکی دی مسوڵمان بۆوە، ئایا ئەو کردەوانەی پێشێ کردوونی لەجێی خۆیان ماون؟ بۆ وێنە: ئەگەر حەجی کرد، حەجەکەی لەسەر

١) بڕوانە: (الجامع لأحكام القرآن) للقرطبي، ج: (٣)، ص: (٤٣).

لاچووە، یان دووبارە دەبێ حەجێ بکاتەوە؟ (مالك) ڕەحمەتی خوای لێبیو هەندێك لە زانایان، دەڵێن: هەموو شتێكی هەڵدەوەشێتەوە.

هەندێكی دیكەش كە (شافعي) یەكێكیانە، ڕەحمەتی خوای لێبێ، دەڵێ: نەخێر مادام مسوڵمان بۆوە، كردەوەكانی پێشووی دەچنەوە جێی خۆیان، چونكە خوای زاناو شارەزا دەفەرموێ: ﴿ فَيَمُتْ وَهُوَ كَافِرٌ فَأُوْلَٰٓئِكَ حَبِطَتْ أَعْمَٰلُهُمْ ﴾، كەواتە: دەبێ بە كافریی بمرێ، ئەوجار كردەوەكانی هەڵوەشانەوەنەوە، بەڵام ئەگەر بە كافریی نەمردو دوایی بە مسوڵمانەتیی مرد، ئەوە كردەوەكانی دەچنەوە جێی خۆیان، ئەوەش لە ڕەحمەتی خوای پەروەردگار نزیكترە، بۆیە واش پێدەچێت ڕای دووەم بەهێزتر بێت، شایانی باسیشە بە پێی بنچینەی: (يحمل المُطْلَق على المقيَّد) كە لە شوێنەكانی دیكەی قورئاندا، خوای دادگەر بە ڕەهایی فەرموویەتی: كردەوەكانی باباى هەڵگەڕاوە هەڵدەوەشێنەوەو، لێرەدا بەنددار (مقيَّد)ی كردوە بەوەوە، كە ئەگەر لەسەر كوفر بمرێ، كەواتە: لە شوێنەكانی دیكەش هەر ئەمە مەبەستەو باباى هەڵگەڕاوە، ئەگەر پێش مردنی تۆبە بكاتو بگەڕێتەوە بۆ ئیمانو ئیسلام، كردەوە چاكەكانی بە هەڵوەشاوە دانانرێن.

**مەسەلەی دەیەمو كۆتایی:** ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَٱلَّذِينَ هَاجَرُواْ وَجَٰهَدُواْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ أُوْلَٰٓئِكَ يَرْجُونَ رَحْمَتَ ٱللَّهِ ۚ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴾، ئەوانەی ئیمانیان هێناوە، وە ئەوانەی كۆچیان كردوەو تێكۆشاون لە ڕێگای خوادا ﷻ {چونكە وشەی: (جاهدوا) تەنیا جەنگكردن ناگەیەنێ، بەڵكو هەموو ماندووبوونێكو هەموو تێكۆشانێك دەگرێتەوە}، ئا ئەوانە بە ئومێدی بەزەیی خوان، یانی چی؟ یانی: ئەوان جێی خۆیەتی بەتەمای ڕەحمەتی خوابن، ئەمما ئەوەی ئیمان بەنیسكێ دەسپێرێو هەروا بە خەیاڵ دەیەوێ بچێتە بەهەشتێ! ئەوە وەك حەسەنی بەصریی گوتوویەتی: {لَيْسَ الإِيْمَان بالتّمَنّي ولاَ بالتَحَلّيِّ ولَكِن هُوَ مَا وَقَرَ في القَلب وَصَدَّقَهُ العَمَل}، واتە:

ئیمان بە خۆزگە خواستن و بەقسەی شیرین نیە، بەڵکو ئەوەیە کە لەدڵدا جێگیر دەبێ و کردەوەش ئینسان دەی چەسپێنێ... کەواتە: دەبێ ئینسان خاوەن ئیمان بێ و لەکاتی خۆیدا ئامادەبێ کۆچ بکات و ئامادەبێ جیهاد بکات، ئەوجار بەتەمای ڕەحمەت و بەزەیی خوا بێ، بەڵام لەکاتێکدا ئیسلام پەکی لەسەر ئەوە دەکەوێ، کۆچی لە پێناودا بکات و، جیهادی لە پێناودا بکات و، ماڵی لە پێناودا ببەخشێ و فیداکاریی لە پێناو بکات، ئەویش هیچی بۆ ناکات، کەچی بە تەمای بەهەشتیشە، ئەوە لەڕاستیدا ئومێدەکەی لەجێی خۆیدا نیەو، بەس دەبێ ئەوانە چاوەڕێی ڕەحمەتی خوابن، کە لە طاعەتی خوا دان، وە فەرمانەکانی خوا ﷻ جێبەجێ دەکەن، خوای پەروەردگار بە کەرەمی خۆی لەو کەسانەمان بگێڕێ.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی چل و پێنجەمین

## پێناسـەی ئەم دەرسـە

ئەم دەرسەمان ئایەتەکانی ژمارە: (٢١٩و ٢٢٠و ٢٢١) دەگرێتـە خـۆی لـە سووڕەتی (البقرة)، لەم سێ ئایەتەدا خوای پەروەردگار باسی پرسیارکردن دەربارەی شەڕابو قومار دەکات، وە وەڵامیشی دەداتەوە، وە باسی پرسیارکردن دەربارەی ماڵ بەخشین چ جۆرە ماڵێك ببەخشـرێت؟ دەکات، وە وەڵامیشی دەداتەوە، وە باسی پرسـیارکردن دەربارەی چۆنیەتی مامەڵەکردن لەگەڵ هەتیواندا دەکات، چۆن مامەڵەیان لەگەڵـدا بکرێ؟ وەڵامیشی دەداتەوە، وە باسی ئەوە دەکات کە قەدەغەیە مسوڵمان ئافـرەتی کافر بێنی، وە ئافرەتی مسوڵمان شوو بە پیاوی کافر بکات، هەرچەندە بەڕواڵەتو جەستەیان، یان ماڵو سامانیان، یان قسەو وتاریان، یان ...یان...هتد، سەرسام (مُعْجَبْ) بن، چونکە هەموو ئەوانە بۆ دنیاو دوارۆژ بەتەنیا مایەی بەختەوەریی‌و سەرفرازیی نین‌و ، بە تۆزە ئیمانێك نابن!

﴿ يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْخَمْرِ وَٱلْمَيْسِرِ ۖ قُلْ فِيهِمَآ إِثْمٌ كَبِيرٌ وَمَنَٰفِعُ لِلنَّاسِ وَإِثْمُهُمَآ أَكْبَرُ مِن نَّفْعِهِمَا ۗ وَيَسْـَٔلُونَكَ مَاذَا يُنفِقُونَ قُلِ ٱلْعَفْوَ ۗ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمُ ٱلْـَٔايَٰتِ لَعَلَّكُمْ تَتَفَكَّرُونَ ﴿٢١٩﴾ فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْـَٔاخِرَةِ ۗ وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْيَتَٰمَىٰ ۖ قُلْ إِصْلَاحٌ لَّهُمْ خَيْرٌ ۖ وَإِن تُخَالِطُوهُمْ فَإِخْوَٰنُكُمْ ۚ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ ٱلْمُفْسِدَ مِنَ ٱلْمُصْلِحِ ۚ وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ لَأَعْنَتَكُمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٢٢٠﴾ وَلَا تَنكِحُوا۟ ٱلْمُشْرِكَٰتِ حَتَّىٰ يُؤْمِنَّ ۚ وَلَأَمَةٌ مُّؤْمِنَةٌ خَيْرٌ مِّن مُّشْرِكَةٍ وَلَوْ أَعْجَبَتْكُمْ ۗ وَلَا تُنكِحُوا۟ ٱلْمُشْرِكِينَ حَتَّىٰ يُؤْمِنُوا۟ ۚ وَلَعَبْدٌ مُّؤْمِنٌ خَيْرٌ مِّن مُّشْرِكٍ وَلَوْ أَعْجَبَكُمْ ۗ أُو۟لَٰٓئِكَ يَدْعُونَ إِلَى ٱلنَّارِ ۖ وَٱللَّهُ يَدْعُوٓا۟ إِلَى ٱلْجَنَّةِ وَٱلْمَغْفِرَةِ بِإِذْنِهِۦ ۖ وَيُبَيِّنُ ءَايَٰتِهِۦ لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ ﴿٢٢١﴾ ﴾.

## مانـای وشـه بە وشـەی ئایەتەکـان

((لەبارەی شەڕابو قومار پرسیارت لێدەکەن: بڵێ گوناهێکی گەورەیان تێدایە وێڕای چەند سوودێك بۆ خەڵکی، بەڵام گوناهیان لە سوودیان گەورەترە، وە پرسیارت لێ دەکەن: چی ببەخشن ؟ بڵێ: زیادە (ی پێویستییەکانتان) ئاوا خوا ئایەتەکانیتان بۆ ڕوون دەکاتەوە، بەڵکو بیربکەنەوە ﴿٢١٩﴾ لەبارەی دنیاو دوارۆژەوە، وە لەبارەی هەتیوانەوە پرسیارت لێدەکەن: بڵێ چاکسازیی بۆکردنیان لە هەموو شتێك باشترە، وە ئەگەر تێکەڵییانتان کرد، ئەوە براتانن وە خوا خراپەکارو چاکسازیکار دەزانێو لە یەکیان هەڵدەوێرێ، وە ئەگەر خوا ویستبای سەغڵەتی دەکردن، بێگومان خوا زاڵی کاربەجێیە ﴿٢٢٠﴾ وە ئافرەتانی هاوبەشدانەر مارە مەکەن تاکو ئیمان دێنن، وە کەنیزەکێکی بڕوادار لە ئافرەتێکی هاوبەشدانەر هەرچەندە سەرسامیشتان بکات، چاکترە، وە ئافرەتی بڕوادار لە پیاوانی هاوبەشدانەر مارە مەکەن، هەتا ئیمان نەهێنن، وە کۆیلەیەکی بڕوادار لە هاوبەشدانەرێك هەرچەندە سەرسامیشتان بکات، چاکترە، ئەوانە بەرەو ئاگر (ی دۆزەخ) بانگەواز دەکەنو خواش بەرەو بەهەشتو لێبوردن بەویستی خۆی بانگ دەکات، وە ئایەتەکانی بۆ خەڵکی ڕوون دەکاتەوە، بەڵکو پەند وەربگرن (و بیربکەنەوە) ﴿٢٢١﴾)).

## شیکردنەوەی هەندێك لە وشەکان

(**الْخَمْرِ**): بە کوردی دەڵێن: مەی یان شەڕاب، {(أصْلُ الخَمْرِ: سَتْرُ الشَّيءِ، ويُقَالُ لِما يُسْتَرُ بِهِ خِمَارٌ) وَرُوِيَ (خَمِّروا آنِيَتَكُمْ) (رَوَاهُ البُخَارِيُّ بِرقم: (٥٦٢٣)} (وَالخَمْرُ سُمِّيَتْ لِكَونِهَا خَامِرَةً لِمقرِّ العَقْلِ)، واتە: وشەی (الخَمْرِ) لە ڕیشەدا بەمانای داپۆشینی شتێك دێت، وە ئەو شتەی کە شتێکی پێ دادەپۆشرێت پێی دەگوترێ (خِمَار) وە سەرپۆشی ئافرەت پێی دەگوترێ: (خِمَار)، وە لە فەرموودەی پێغەمبەردا ﷺ هاتوە، فەرموویەتی (خَمِّروا آنِيَتَكُمْ)، واتە: قاپەکانتان داپۆشن، قاپی سەرئاوەڵا داپۆشن، بۆیەش بە شەڕاب

گوتراوە: (خَمْر) چونکە عەقڵ دادەپۆشێ‌و عەقڵ لە ئینساندا ناهێڵێ.

(**وَٱلْمَيْسِرِ**): (المَيْسِر: القِمارُ، مِنْ يَسَرَ، كالمَوعِدِ والمَرْجِعِ مِن فِعلِهِما، واشتِقاقُهُ مِنَ اليُسْرِ، لأنهُ أَخذ مالِ الرَّجُل بِسهُولَةٍ بغَيرِ كدٍّ ولاَ تَعَب)، واتە: (مَيْسَر) یانی: قومار، کە لە (يَسَرَ)ەوە هاتوە، وەك چۆن دەڵێ (مَوْعِد)و (مرجع) لە (وَعَدَ)و (رَجَعَ)ەوە هاتوون، وە (مَيْسَر) لە (يُسْر) واتە: (سێنا)ەوە هاتوە، چونکە قومار بریتیە لە وەرگرتنی ماڵی پیاوێك بە ئاسانیی‌و بێ زەحمەت‌و ماندوو بوون.

(**إِثْمٌ**): (الإثْم والأَثام: اسْمٌ لِلأفعال المبطِئةِ عَنِ الثَّوابِ، وجَمْعُهُ آثام)، واتە: وشەی: (إثْم)و (أَثام) کە لە قورئاندا هەردووکیان هاتوون، ناون بۆ ئەو کردەوانەی، کە ئینسان لە پاداشت دوا دەخەن‌و، تووشی گوناهی دەکەن، وە کۆیەکەشی بریتیە لە (آثام).

(**وَمَنَٰفِعُ**): (جَمْع مَنْفَعَةَ)، ئنجا ئایا ئەویش لە چی‌یەوە هاتوە؟ دەڵێ: (النَّفْعُ: ما يُسْتَعَانُ بِهِ في الوصُول إلى الخَيْراتِ، فالنَّفْعُ خَيْرٌ، وضِدُّهُ الضُّرُّ)، واتە: وشەی: (النَّفْعُ) هەرشتێکە کە ئینسان دەیکاتە ئامراز (وَسِيلة) بۆ ئەوەی پێی بگاتە خێرو چاکەو بەرژەوەندیی، وە پێچەوانەی (نَفْعُ) بریتیە لە (ضُرٌّ)، واتە: زیان‌و زەرەر، (نَفْع)یش واتە: قازانج‌و سوود.

(**ٱلْعَفْوَ**): ﴿وَيَسْـَٔلُونَكَ مَاذَا يُنفِقُونَ قُلِ ٱلْعَفْوَ﴾، (عَفْو) یانی چی؟ (العَفْو: الفَضْلُ عن النَّفَقَةِ والحاجَة)، واتە: وشەی: (العَفْو) هەرشتێکە کە لە پێداویستیی خۆت زیاد بێت، وە بۆیەش پێی گوتراوە: (العَفْو)، چونکە ئەوەی کە لەخۆت زیادە، ئاسانە خەرجی بکەی، بەڵام شتێك کە بۆخۆت پێویستیت پێبوو، زەحمەتە خەرجی بکەی، بۆیە خوا ﷻ دەفەرموێ پرسیارت لێدەکەن چی ببەخشن؟ بڵێ ئەوەی کە لە خۆتان زیادە، نەك ئەوەی کە خۆتان پەکتان لەسەری کەوتوە.

(لَأَعْنَتَكُمْ)؛ لە (العَنَت)ەوە هاتوە، (العَنَت: الحَرَج والضِّيْق والْمَشَقّة)، (أعْنَتَكُم: أحْرَجَكُم وضَيقٌ عَلَيْكُم (وعَنَت الوجوه للحي القيوم): أي ذَلَّت وخَضَعَتْ وَأعْنَتَهُ أي أذلَّه)، وشەی: (العَنَت)، واتە: سەغڵەتیی و تەنگانەو قورسیی، وە: (أعْنَتَكُم)، واتە: ئێوە سەغڵەتو دەکاتو دەتانخاتە تەنگانەوە، وە (عَنَتِ الوجوه..) یانی: ڕووەکان ملکەچ بوون، وە (أعْنَتَهُ) یانی: ملکەچی کرد.

(ٱلْيَتَمَىٰ)؛ کۆی (يتِيم)ە، یان کۆی (يتِيمة)یە، بەڵام ئێمە لە زمانی کوردییدا بە هەردووکیان دەڵێین: هەتیو، واتە: منداڵێك کە بابی مردبێت. (اليُتمُ: انْقِطَاعُ الصَّبيِّ عَن أبيهِ قَبْلَ بلُوغهِ، وفي سَائِرِ الحَيَوَانَاتِ مِن قِبَلِ أُمِّهِ)، واتە: وشەی: (اليُتْمُ)، واتە: جیابوونەوەی منداڵ لە بابی پێش باڵغبوونی، ئینسان بە بابی هەتیو دەبێت، بەڵام ئاژەڵ بە دایکی هەتیو دەبێتو، هەر بەچکە ئاژەڵێك دایکی مرد بە هەتیو لەقەڵەم دەدرێت، بەڵام منداڵ بە مردنی بابی، بە هەتیو لەقەڵەم دەدرێ.

(أَعْجَبَكُمْ)؛ واتە: سەرسامی کردن، (أعْجَبَكُم: أي رَاقَكُمْ)، واتە: زۆر پێتان چاکەو پێی سەرسام دەبن، (أعْجبني كَذا: أي رَاقني، أي كُنْتُم مُعْجَبين بِهَا بسبب جَمَالِها أو مالِهَا أو حَسَبِهَا...) واتە: منی سەرسام کردوە، یانی: ئێوە پێی سەرسامن بەهۆی جوانییەکەی، یان سامانەکەی، یان ڕەچەڵەکەکەیەوە.

## هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتەکان

١) هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو ئایەتەی، کە دەفەرموێ: ﴿ يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْخَمْرِ وَٱلْمَيْسِرِ ۖ قُلْ فِيهِمَآ إِثْمٌ كَبِيرٌ وَمَنَٰفِعُ لِلنَّاسِ وَإِثْمُهُمَآ أَكْبَرُ مِن نَّفْعِهِمَا ... ﴾.

أ/ {روى أَحَمْد برقم: (٣٧٨)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٣٦٧٠)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٣٠٤٩)، عَنْ عُمَر رَضِي اللهُ عَنهُ أنَّه قَالَ: ((اللَّهُمَّ بَيِّنْ لَنَا في الخَمْرِ بَيَاناً شِافِياً))، فَنَزَلَتِ هَذِهِ الآيَة التي ف ي البقَرة: ﴿ يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْخَمْرِ وَٱلْمَيْسِرِ ۖ قُلْ

فِيهِمَآ إِثْمٌ كَبِيرٌ ... ﴾، فَدُعِي عُمَر فَقُرِئَت عَلَيهِ فَقَالَ: اللَّهُمَّ بَيِّن لَنَا فِي الخَمْرِ بَيَاناً شَافِياً، فَنَزَلَت الآية التي في النِسَاء: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَقۡرَبُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَنتُمۡ سُكَٰرَىٰ حَتَّىٰ تَعۡلَمُواْ مَا تَقُولُونَ ...﴿٤٣﴾ ﴾، فَكَان مُنَادي رَسُولَ الله ﷺ إذَا أقَامَ الصَّلاَةَ نَادى: أن لايَقرَبَنَّ الصَّلاَةَ سَكرانٌ، فَدُعِي عُمَر فَقُرِئَت عَلَيهِ، فَقَالَ: اللَّهُمَّ بَيِّن لَنَا في الخَمْرِ بَيَاناً شَافِياً، فَنَزَلَتْ الآية التي في المائِدة فَدُعي عُمَرُ فَقُرِئَت عَلَيهِ فَلَمّا بَلَغَ إلى ﴿ ... فَهَلۡ أَنتُم مُّنتَهُونَ ﴿٩١﴾ ﴾المائدة ، قَالَ عُمَر: إنتَهَينا إنتَهَينا}، واتە: ئەحمەدو ئەبو داوودو تیرموذیی لە عومەرەوە خوا لێی ڕازیبێ گێڕاویانەتەوە، کە گوتوویەتی: ئەی خوایە دەربارەی شەڕاب خواردنەوە ڕوونکردنەوەکی باشمان بۆ بنێرە خوار (ئایا بیخۆینەوە یان نەیخۆینەوە؟ پێش قەدەغە بوونی)، جا ئەم ئایەتەی سووڕەتی (البقرة) هاتە خوار، کە دەفەرموێ: ﴿ يَسۡـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلۡخَمۡرِ وَٱلۡمَيۡسِرِۖ قُلۡ فِيهِمَآ إِثۡمٌ كَبِيرٌ .... ﴾، عومەر بانگکراو ئایەتەکەی بۆ خوێنرایەوە (بەڵام تەواو دڵی پێیدا نەکەوت) گوتی: ئەی خوایە ! دەربارەی شەڕاب خواردنەوە ڕوونکردنەوەکی باشمان بدەیە (ئایا بیخۆینەوە یان نەیخۆینەوە؟)، چونکە ئەو ئایەتە کە دەفەرموێ: ﴿ فِيهِمَآ إِثۡمٌ كَبِيرٌ وَمَنَٰفِعُ لِلنَّاسِ ﴾، نەیفەرمووە مەیخۆنەوە، ئنجا ئەم ئایەتەی دیکەی سووڕەتی (النساء) هاتە خوارێ کە دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَقۡرَبُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَنتُمۡ سُكَٰرَىٰ حَتَّىٰ تَعۡلَمُواْ مَا تَقُولُونَ ...﴿٤٣﴾ ﴾، ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە ! توخنی نوێژی مەکەون بە سەرخۆشیی (واتە: هەتا سەرخۆشن نوێژێ مەکەن)، جا دوای هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتەی سووڕەتی (النساء) بانگدەری پێغەمبەر ﷺ کە بانگی دەداو قامەتی دەکرد، دەیفەرموو: ئەوەی سەرخۆشە با جارێ نەیەتە نوێژ، (واتە: سەرخۆشەکانیش

بۆیان هەبوو نوێژێ بکەن، بەڵام دەیفەرموو: با نەیەن بۆ نوێژێ، یانی لە ماڵی خۆی نوێژێ بکات، نەیەت بۆ مزگەوت یان با بەسەر خۆشیی نوێژی نەکات، تاکو سەرخۆشیی بەریدەدات)، ئنجا عومەر دووبارە بانگکرا خوا لێی ڕازیبێ وە ئەو ئایەتەی (النساء)یشی بەسەر خوێندرایەوە، دووبارە عومەر گوتی: ئەی خوایە! دەربارەی شەڕاب خواردنەوە ڕوونکردنەوەکی باشمان بدەیە، {واتە: پێویستیمان بەوە نەکات بڵێین: دەبێ شەڕاب حەرام بێ، یان حەڵاڵ؟}، ئنجا ئەم ئایەتە کە لە سوورەتی (المائدة)دا هەیە هاتە خوار، کە دەفەرموێ:

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّمَا ٱلۡخَمۡرُ وَٱلۡمَيۡسِرُ وَٱلۡأَنصَابُ وَٱلۡأَزۡلَٰمُ رِجۡسٞ مِّنۡ عَمَلِ ٱلشَّيۡطَٰنِ فَٱجۡتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ﴿٩٠﴾ إِنَّمَا يُرِيدُ ٱلشَّيۡطَٰنُ أَن يُوقِعَ بَيۡنَكُمُ ... وَيَصُدَّكُمۡ عَن ذِكۡرِ ٱللَّهِ وَعَنِ ٱلصَّلَوٰةِۖ فَهَلۡ أَنتُم مُّنتَهُونَ ﴿٩١﴾﴾، واتە: ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە! بێگومان شەڕابو قومارو بتەکانو زەلەمەکان - کە بۆ یانسیب بەکاردێن — پیسن لە کردەوەی شەیطانن، دەجا لێیان دوور بکەونەوە بەڵکو سەرفراز بن، بێگومان شەیطان تەنیا مەبەستی ئەوەیە کە بەهۆی شەڕابو قومارەوە دوژمنایەتییو ڕقو بوغزتان بخاتە نێو، وە لەیادی خواو لە نوێژ بتانگێڕێتەوە، جا ئایا هەر دەست هەڵناگرن ؟! سەرەتا دەفەرموێ: ئەوانە لە کردەوەی شەیتانن، وازیان لێبێنن، دوایی دەفەرموێ: ئایا وازناهێننو دەستبەرداری شەڕابو قومار نابن ؟! جا کە بەسەریدا خوێندرایەوە، عومەر گوتی: (إنتهينا إنتهينا) وازمان هێنا، وازمان هێنا، مادام خوا فەرمووی: پیسەو لە کردەوەی شەیطانە، ئایا هەر وازناهێنن؟! ئەوە وازمان هێنا وازمان هێنا.

**ب/** هەروەها نەیسابووریی لە: (أسباب النزول)ەکەیدا[1] ئەمەی هێناوە: {نَزَلَتْ فِي عُمَر بن الخَطَّاب، ومُعَاذ بن جَبَل و نَفَر مِنَ الأنصَار رَضِيَ الله عَنْهُم أتوا رَسُولَ الله ﷺ، فَقَالوا: أفتِنَا فِي الخَمْرِ والمَيْسِر فإنَّهُمَا مَذْهَبَةٌ

---

١) (أسباب النزول)، ص: (٤٨ - ٤٩).

لِلعَقْلِ مَسْلَبةٌ لِلمَالِ، فأنْزَلَ اللهُ تعالى هَذهِ الآية }، واتە: عومەری کوڕی خەتتابو موعازی کوڕی جەبەل لەگەڵ کۆمەڵێك لە پشتیوانەکان چوونە خزمەت پێغەمبەر ﷺ گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا !، دەربارەی شەڕابو قومار فەتوامان بۆ بدەو پێمان ڕابگەیەنە حوکمیان چییە؟ چونکە عەقڵ لادەبەنو ماڵیش تارومار دەکەن، جا خوا ﷻ ئەم ئایەتەی نارده خوار.

ئەوانەی کە قومار دەکەنو شەڕاب دەخۆنەوە تەماشایان بکە، بە زۆریی وایە ڕووتو ڕەجاڵن، بابای قومارچی جارێك دەیباتەوە (١٠) جاران دەیدۆڕێنێ، وە کە خووی بە شەڕاب خواردنەوە گرت هەموو ماڵی خۆی لە پێناودا سەرف دەکات.

٢) هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو ئایەتە، کە دەفەرموێ: ﴿ وَيَسْـَٔلُونَكَ مَاذَا يُنفِقُونَ قُلِ ٱلْعَفْوَ ... ﴾، {أخْرَجَ ابن اسحاق وابن أبي حاتِم أنَّ نَفَراً مِنَ الصّحَابةِ حِيْنَ أُمِرُوا بالنَّفَقَةِ في سَبِيل الله، أتوا النَّبيَّ ﷺ فَقَالوا: إنَّا لاَنَدري مَا هَذهِ النَّفَقَة التي أمِرنا بِهَا في أمْوَالِنا فِمَا نُنفِق مِنهَا؟ فأنْزَلَ اللهُ هَذهِ الآيَة...}، واتە: کۆمەڵێك لە هاوەڵانی بەڕێزی پێغەمبەر ﷺ دوای ئەوەی فەرمانیان پێکرا، ماڵی خۆیان لە پێناوی خوادا ﷻ سەرف بکەن {وەك فەرموویەتی: ﴿ وَأَنفِقُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ وَلَا تُلْقُوا۟ بِأَيْدِيكُمْ إِلَى ٱلتَّهْلُكَةِ ﴾}، چوونە لای پێغەمبەر ﷺ گوتیان: ئەو ماڵ خەرج کردنو، نەفەقەیەی فەرمانمان پێکراوە، نازانین کامەیە، ئایا چ شتێك لە ماڵی خۆمان سەرف بکەین؟ {هەمووی سەرف بکەین نیوەی سەرف بکەینو چۆنی سەرف بکەین}؟ خواش ئەم ئایەتەی نارده خوارێ، کە دەفەرموێ: ﴿ وَيَسْـَٔلُونَكَ مَاذَا يُنفِقُونَ قُلِ ٱلْعَفْوَ ... ﴾، واتە: لێت دەپرسن چی سەرف بکەنو ببەخشن لە ماڵو سامانی خۆیان؟ بڵێ: ئەوەی کە زیادەو پەکتان لەسەری نەکەوتوە، خۆتانو ئەوانەی نەفەقەی لەسەرتان پێویستە، ئەگەرنا، وەك کوردەواریی خۆمان دەڵێن: (هەتا ماڵێ پێویستی پێبێ بۆ مزگەوت ناشێ)، لەوەیان

وەرگرتوە كە دەبێت لەخۆت زیاد بێ، ئەوجار خێرێ بكەی، بەڵام شتێك بۆخۆت پەكت لەسەر كەوتوەو دوایی بۆخۆت دەست لە خەڵكی پانبكەیەوە، جا لەجیاتی ئەوە هەر خێرێ مەكەو خێرەكە بەخۆتوماڵو منداڵی خۆت بكە.

٣) هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو ڕستەیە، كە دەفەرموێ: ﴿وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْيَتَـٰمَىٰ ۖ قُلْ إِصْلَاحٌ لَّهُمْ خَيْرٌ ۖ وَإِن تُخَالِطُوهُمْ فَإِخْوَٰنُكُمْ ۚ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ ٱلْمُفْسِدَ مِنَ ٱلْمُصْلِحِ ۚ وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ لَأَعْنَتَكُمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ﴾، {(عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: لَمَا أَنزَلَ اللهُ ﷻ: ﴿وَلَا تَقْرَبُوا۟ مَالَ ٱلْيَتِيمِ إِلَّا بِٱلَّتِى هِىَ أَحْسَنُ ... ﴿١٥٢﴾﴾ الأنعام، وقولهِ تعالى: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَأْكُلُونَ أَمْوَٰلَ ٱلْيَتَـٰمَىٰ ظُلْمًا إِنَّمَا يَأْكُلُونَ فِى بُطُونِهِمْ نَارًا ۖ وَسَيَصْلَوْنَ سَعِيرًا ﴿١٠﴾﴾ النساء، انْطَلَقَ مَنْ كَانَ عِنْدَهُ يَتِيمٌ فَعَزَلَ طَعَامَهُ مِنْ طَعَامِهِ، وشَرَابَهُ مِنْ شَرَابِهِ، فَجَعَلَ يَفْضُلُ الشَّيءُ مِنْ طَعَامهِ وشَرَابِهِ فَيَحْبِسُ لَهُ، حَتَّى يأكُلَهُ أو يَفْسُدَ، واشتدّ ذَلِكَ عَلَيهِم، فذكروا ذَلِكَ لرَسولَ اللهِ فَأَنْزَلَ اللهُ ﷻ: ﴿وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْيَتَـٰمَىٰ ۖ قُلْ إِصْلَاحٌ لَّهُمْ خَيْرٌ ۖ وَإِن تُخَالِطُوهُمْ فَإِخْوَٰنُكُمْ ..﴾، فَتَخْلِطُوا طَعَامهم بطعَامِكم و شَرَابهُم بشرابكُم) (أَخْرَجَهُ أَبُو دَاوُدَ بِرقم: (٢٨٧١)، وَالنَّسَائِيُّ بِرقم: (٦٤٩٦)، وَحَسَّنَهُ الألباني في (سنن أبي داود)}، تەماشای هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ بكەن چەند هەستیار بوون، كاتێك خوای بەرز ﷻ ئەم فەرمایشتانەی خۆی ناردە خوارێ كە دەفەرموێ: ﴿وَلَا تَقْرَبُوا۟ مَالَ ٱلْيَتِيمِ إِلَّا بِٱلَّتِى هِىَ أَحْسَنُ ... ﴿١٥٢﴾﴾ الأنعام، توخنی ماڵی هەتیو مەكەون مەگەر بەكام شێوەی زۆر چاكترە، واتە: مەگەر زۆر بە چاكیی ئەگەرنا دەستكاریی ماڵی هەتیو مەكەن، وە دوای ئەوە كە خوا ﷻ ئەوەشی ناردە خوارێ كە دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَأْكُلُونَ أَمْوَٰلَ ٱلْيَتَـٰمَىٰ ظُلْمًا إِنَّمَا يَأْكُلُونَ فِى بُطُونِهِمْ نَارًا ۖ وَسَيَصْلَوْنَ سَعِيرًا ﴿١٠﴾﴾ النساء، واتە: بێگومان ئەوانەی ماڵی

هەتیوان دەخۆن بە زوڵم، ئەوە ئاگر لە زگی خۆیان دەئاخنن‌و دەخرێنە کلپەی دۆزەخەوە، دوای ئەوەی ئەم ئایەتانە هاتنە خوار، کۆمەڵێك لەوانەی کە ماڵی هەتیوانیان لابوو لە هاوەڵانی بەڕێز، خواردن‌و خواردنەوەکانیان جیاکردنەوە، (ئەگەر دۆشاو بوو، ئەگەر سرکە بوو، ئەگەر هەرچی بوو جیایان کردەوە) کابرا هەتیوێك (یان زیاتری) لە ماڵێ دابوو خواردنێکی بۆ ساز دەکرد، لە هی خۆی دوایی کە خواردنەکەی لێ زیاد دەبوو بۆی هەڵدەگرت، وە جاری وابوو خواردنەکە خەسار دەبوو، دیارە ئەوەش زۆر بۆیان زەحمەت بوو، {کابرا ئەگەر لە ماڵێکدا خواردن ساز بکات بۆی ئاسانترە، نەك دوو ئاگران بکاتەوەو دوو چێشتان ساز بکات، ئەوە بەزەحمەت بوو بەلایەنەوە} بۆیە ئەوەیان بۆ پێغەمبەر ﷺ باسکردو گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا! ئێمە دوای ئەم ئایەتانەی هاتوونەتە خوارێ، تووشی سەغڵەتیی‌و زەحمەت بووین، ئایا چی بکەین‌و چۆن مامەڵە لەگەڵ هەتیواندا بکەین؟ خواش ئەم ئایەتەی ناردە خوارێ.

تەماشای قورئان بکەین هەمووی، بەتایبەتی ئایەتەکانی ئەحکام، هەمووی چارەسەری گرفت‌و کێشەو وەڵامی پرسیارانە، دەفەرموێ: ﴿ وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْيَتَـٰمَىٰ ۖ قُلْ إِصْلَاحٌ لَّهُمْ خَيْرٌ ... ﴾، پرسیارت لێدەکەن دەربارەی هەتیوان، بڵێ: چی بۆ وان چاکسازییە ئەوە پەسەندە، {واتە: چی بۆ وان بەرژەوەندییە، وایان بۆ بکەن لە ماڵ‌و سامانیاندا، چ شتێك لە ماڵەکانیان بۆ دەخەنە بازرگانییەوە، چییان بۆ دەکەن، چۆن بۆ وان چاکە، وابکەن} ﴿ وَإِن تُخَالِطُوهُمْ ﴾، وە ئەگەر ماڵەکەی خۆتان تێکەڵی هی وان کرد، وە خواردنیان لەگەڵ هی خۆتان بۆ ساز بکەن‌و تێکەڵی بکەن، یان خواردنەوەیان تێکەڵی خواردنەوەتان بکەن، یان لەگەڵ ماڵەکەی خۆتاندا کەسابەتیان بۆ بکەن، ﴿ فَإِخْوَٰنُكُمْ ﴾، ئەوە براتانن، وەك چۆن زوڵم لە برای خۆت ناکەی، زوڵم لەویش مەکە ﴿ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ ٱلْمُفْسِدَ مِنَ ٱلْمُصْلِحِ ﴾، وە خواش دەزانێ کێ چاکخوازەو، کێش خراپەکارە، فێڵ لە خوا ﷻ ناکرێ ﴿ وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ لَأَعْنَتَكُمْ ﴾، وە خوا ئەگەر ویستبای

سەغڵەتی دەکردن، وەك پێوەی سەغڵەت بوون، بەڵام خوا ڕێتان بۆ ئاسان دەکات، بەشێوەیەك کە لەسەرتان قورس نەبێ.

٤) هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو ئایەتە، کە دەفەرموێ: ﴿وَلَا تَنكِحُوا۟ ٱلْمُشْرِكَٰتِ حَتَّىٰ يُؤْمِنَّ﴾، {أَخْرَجَ ابْنُ أَبِي حَاتِمٍ وَابْنُ الْمُنذِرِ عَن مقاتل ابن حيَّان قَالَ: نَزَلَتْ هَذِهِ الآيَة فِي (أبِي مَرْثَد الغَنَوي) إستأذن النَّبِيَّ ﷺ، فِي عَنَاق أن يَتَزَوّجَهَا، وكَانَت ذَات حَظٍّ مِن الجمال، وهِيَ مُشْرِكَة، وأبو مَرْثَد يَومئِذٍ مُسلم، فَقَالَ: يارَسُولَ اللهِ ﷺ إنَّهَا لتُعجِبُنِي، فَأنزَلَ الله: ﴿وَلَا تَنكِحُوا۟ ٱلْمُشْرِكَٰتِ حَتَّىٰ يُؤْمِنَّ﴾} (أسباب النزول للواحدي ص: ٦٥)، واتە: (إبن أبي حاتم وإبن المنذر) لە (مقاتل إبن حيان)، دەگێڕنەوە کە ئەم ڕستە قورئانییەی دەفەرموێ: ﴿وَلَا تَنكِحُوا۟ ٱلْمُشْرِكَٰتِ حَتَّىٰ يُؤْمِنَّ﴾، دەربارەی (أبي مَرْثَد الغَنَوي) هاتۆتە خوار، کە یەکێك بوو لە هاوەڵانی پێغەمبەرو داوای مۆڵەتی لە پێغەمبەر ﷺ کرد ئافرەتێك بێنی، ناوی (عەناق) بوو، ئافرەتێکی جوان بوو پشك و بەشێکی لە جوانییدا هەبوو، بەڵام کافرو، بت پەرست بوو، (أبي مَرْثَد الغَنَوي)یش ئەوکاتە مسوڵمان بوو، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ زۆرم پێ جوانە، پێی سەرسامم! خوای بەرزیش ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە کە دەفەرموێ: ئافرەتانی بتپەرست و هاوبەشدانەر مەهێنن تا ئیمان نەهێنن، (دروست نیە ئینسانی مسوڵمان ئافرەتی کافر بکاتە هاوسەری خۆی).

٥) هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو ئایەتە، کە دەفەرموێ: ﴿وَلَأَمَةٌ مُّؤْمِنَةٌ خَيْرٌ مِّن مُّشْرِكَةٍ وَلَوْ أَعْجَبَتْكُمْ﴾، {أَخْرَجَ الوَاحِدي وإبن عَسَاكِر مِن طَريق السُّدّي عَنْ أبي مالك، عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنه قَالَ: نَزَلَتْ فِي عَبدِالله بن رَوَاحَة، وكَانَت لَهُ أَمَةٌ سَودَاء، وأنَّهُ غَضِبَ عَلَيها فَلطَمَهَا ثُمَّ انَّهُ فَزِعَ فأتى النَّبِيّ ﷺ فأخبرهُ خَبَرَهَا، فَقَالَ: النَّبِيُّ ﷺ لَهُ: ما هِيَ يا عَبدالله؟ قَالَ: تَصُومُ وتُصَلّي وتُحْسِنُ الوضوءَ وتَشْهَدُ أَنْ لاَ إلَهَ إلاَّ اللهُ وَأَنَّكَ رَسُولُ الله، فَقَالَ: يا

عَبدُالله هَذِهِ مُؤمِنَةٌ، فَقَالَ عبدالله: فَوَالَّذي بَعَثَكَ بِالحَقِّ لأَعْتِقَنَّها ولأَتَزَوجنَّها فَفَعَل، فَطَعَن عَلَيهِ ناسٌ مِن المُسلِمينَ وقالُوا: نَكَحَ أَمَةً ! فَأَنزَلَ اللهُ فِيهم: ﴿ وَلَأَمَةٌ مُّؤْمِنَةٌ خَيْرٌ مِّن مُّشْرِكَةٍ وَلَوْ أَعْجَبَتْكُمْ ﴾} (أسباب النزول للواحدي، ص (٦٥)، و(لُباب النقول في أسباب النزول للسيوطي)، ص (٤٦)، عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس خوا لێیان ڕازی بێ گێڕاویەتەوە، کە ئەم ئایەتەی دەفەرموێ: ﴿ وَلَأَمَةٌ مُّؤْمِنَةٌ خَيْرٌ مِّن مُّشْرِكَةٍ وَلَوْ أَعْجَبَتْكُمْ ﴾، {کەنیزەکێکی ئیماندار باشترە لە ئافرەتێکی هاوبەش بۆ خوادانەر با پێشی سەرسام بن} دەربارەی عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحە {کە شاعیری پێغەمبەر ﷺ بوو، یەکێك بوو لەو سێ فەرماندەیەی کە لە جەنگی (مؤتة)دا شەهیدکران} هاتە خوارەوە، کە کەنیزەکێکی ڕەش پێستی هەبوو، ڕۆژێك لێی تووڕە بوو زللەیەکی لێدا، دوایی زانی هەڵەی کردوە {ئەوانە کە هەڵەیەکیان کردوە، یەکسەر زانیویانە، چونکە دڵێکی هەستیارو هۆشیاریان هەبووە}، یەکسەر چوو بۆ لای پێغەمبەر ﷺ هەواڵی پێدا گوتی: من لە کەنیزەکەکەم تووڕە بووم و زللەیەکم لێداوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: کێیە؟ (واتە: ئەو کەنیزەکە چۆنە؟)، گوتی: ڕۆژوو دەگرێ و نوێژێ دەکات و دەستنوێژ جوان هەڵدەگرێ، وە شایەتمان بەوە دێنێ، کە جگە لە خوا پەرستراوی دیکە نین، وە بەوە کە تۆ ڕەوانەکراوی خوای، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەی عەبدوڵڵا ئەوە ئیماندارە {واتە: چۆن لێت داوە؟ هیچ کەنیزەکێك نابێ لێی بدرێ، بە تایبەتی ئەگەر ئیمانداریش بێ}، عەبدوڵڵا گوتی: سوێند بەوەی کە تۆی بە هەق ناردوە من ئازادی دەکەم، وە دواییش دەیکەم بە هاوسەری خۆم، وە وایکرد، جا لەوبارەوە خەڵکێك لە مسوڵمانان تانەیان لێداو گوتیان: کەنیزەکێکی مارە کردوەو، کردوویەتی بە هاوسەری خۆی، {دیارە ئەو کات کەنیزەك پلەیەکی کۆمەڵایەتی نزمی هەبووە، واتە: خەڵك گوتیان: چۆن دەبێت ئینسان کەنیزەك بێنێ؟}، بەڵام خوای دادگەر ئەم ئایەتەی نارده خوار: ﴿ وَلَأَمَةٌ مُّؤْمِنَةٌ خَيْرٌ مِّن مُّشْرِكَةٍ وَلَوْ أَعْجَبَتْكُمْ ﴾، کەنیزەکێکی ئیماندار باشترە لە ئافرەتێکی هاوبەش بۆ خودا دانەر، هەرچەندە

ئەو ئافرەتە هاوبەش بۆ خـوا دانەرە {ئـازادیش‌و زۆریش جوان بێـت‌و} ئێـوە سەرسام بکات، بەڵام کەنیزەکەکە بەسـەر ویدا هەڵبژێرە، مادام ئیماندارە.

## مانـــای گشـــتی ئایەتەکـــان

لەم ئایەتانەدا خـوا ﷻ پێغەمبـەری خۆی ﷺ دەدوێنـی کـە دیارە پرسـیار لـە پێغەمبـەر ﷺ کـراوە دەربـارەی شـەڕاب‌و قومـارو چـەند مەسـەلەیەکی دیکـەش، دەفەرموێ: ﴿ يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْخَمْرِ وَٱلْمَيْسِرِ ﴾، دەبارەی شەڕاب‌و قومار پرسـیارت لێدەکەن، داخۆ حەڵاڵـن یـاخود حـەڕامن، ئێمـە ڕەنگـە پێمـان سـەیر بێت ! بۆیـە پێمان سـەیرە، چونکە ئێمـە کـە چاومان هەڵهـێناوە زانیوومانـە ئەوانـە حـەڕامن، بەڵام کۆمەڵگای ئیسلامیی یەکەم، پلـە پلـە هات، ئـەو شتانە خۆ هـەمووی حـەڕام نەبوون، جا ئەمەش ئەوەی لێوەردەگیـرێ کە کۆمەڵگـای ئیسـلامیی بە خەیاڵ پـڵاو دروست نـابێ‌و دەوڵەتی ئیـسلامیی بـەخیاڵ پـڵاو دروسـت نابێ، ئـەم قورئانـە بـە بیست‌و سێ ساڵ هاتۆتە خوار، پێغەمبـەر ﷺ بـە بیسـت‌و سـێ سـاڵ کۆمەڵگـاو دەوڵەتی ئیسلامیی بنیات ناوە، نەك بە شـەوو ڕۆژێـك، کەسـی وا هـەیـە پێی وایـە ئەگـەر دەسـتەڵاتی هـەبوو دەبـێ بێنـی یەکـسەر بڕیـار بـدات، هەرچـی واجباتـە جێبەجێ بکرێ‌و هەرچی قەدەغـە کـراوە دەبـێ مـەنع بکرێ! بـەڵکو هـی وا هەیـە تەنیا بە واجبەکـان‌و حـەڕامەکان ڕاناوەستێ‌و دەڵـێ دەبـێ هـەموو سوننەتەکانیش جێبـەجێ بکـەن، یـان ئـەوەی ئـەو بـە سوننەتیـان دەزانـێ! جـا خـوا دەفـەرموێ: پرسـیارت لێدەکـەن دەربـارەی شـەڕاب‌و قومـار ﴿ قُلْ فِيهِمَآ إِثْمٌ كَبِيرٌ وَمَنَٰفِعُ لِلنَّاسِ ﴾، تـۆ وەڵامیـان بـدەوە، بڵـێ: وەك واقیـع گونـاهێکی گـەورەیان تێدایـە، وە کۆمەڵێك سوودو بەرژەوەندییشیان تێدایە بۆ خەڵکی، تەماشا بکەن ! ئیسلام چەند واقیع بینـە ! خوا دەفـەرموێ: شـەڕاب‌و قومـار گونـاهێکی گـەورەیان تێدایـە، بـەڵام سـوودو قازانجیشـیان تێدایـە، سـوودو قازانجـەکانیان چـی بوون؟ ئەوەیـە کـە کـابرا شەڕاب دەخواتەوە سەرخۆش دەبێ‌و لـە دنیـا بێخەبـەر دەبـێ‌و دەچـێتە جیهانێکی خەیاڵییەوە، وە جۆرێك لە حاڵەتی دەروونیی وای بۆ دروست دەبێت، دەڵێن: کەسی

سەرخۆش پێی وایە پادشایە !! وە کابرا قومار دەکات دەیباتەوەو قازانج دەکات، دڵخۆشییەکی کاتی پێدەگات، یان لە ڕووی بازرگانییەوە قازانج دەکەن‌و سوودێکیان پێدەگات سوودەکانیان ئەوانەن، ﴿ وَإِثْمُهُمَآ أَكْبَرُ مِن نَّفْعِهِمَا ﴾، بەڵام گوناهیان لە سوودیان گەورەترە، دیارە ئەوەندە بۆخۆی بەس بوو، بۆ کەسێك چاك لە قورئان تێبگات، کە دەست لە قومارو شەڕاب هەڵبگرێ، بەڵام خوا بە شێوەیەکی یەکلاییکەرەوە نەیفەرمووە، بۆیە هەموو جارێ عومەر خوا لێی ڕازیبێ دووبارەی کردۆتەوەو گوتوویەتی: خوایە ! ڕوونکردنەوەیەکی یەکلاییکەرەوەمان بۆ بنێرە ! پێم وایە عومەر خوا لێی ڕازی بێ ئەگەر پێشتر بەکاریشی هێنابێ، هەر لە یەکەم جارەوە دەستی لێ هەڵگرتوون، بەڵام خۆ هەموو کەس وەك وی تێناگات ئەوە ، ئنجا دێتە سەر بابەتێکی دیکە ! ﴿ وَيَسْـَٔلُونَكَ مَاذَا يُنفِقُونَ قُلِ ٱلْعَفْوَ كَذَٰلِكَ ﴾، پرسیاریشت لێدەکەن چ شتێك ببەخشن لە ماڵی خۆیان ؟ بڵێ: ئەوەی کە زیادە، واتە: زیادە لە پێداویستییەکانی خۆتان، بەڵام تۆ بۆخۆت پەکت لەسەر شتێك کەوتبێ، کەچی بێنی بیکەیە خێر، بۆخۆشت دوایی چاوت لەدەستی خەڵکی بێت ! یان چاوت لە دواى بێت، ئەوە ماناى وایە هیچت نەکرد ! بەڵێ، مسوڵمان دەبێت لێزان بێت، ئیسلام ئایین‌و بەرنامەیەکی واقیع بینە، بۆیە دەفەرموێ: ئەوەی لەخۆت زیادە، بیکە خێر، ﴿ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمُ ٱلْأَيَٰتِ لَعَلَّكُمْ تَتَفَكَّرُونَ ﴾، ئاوا خوا ئایەتەکانی خۆی بۆ ئێوە ڕوون دەکاتەوە، بۆ ئەوەی بیربکەنەوە، بیر لە چی بکەنەوە؟ ﴿ فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْءَاخِرَةِ ﴾، بیر لە دنیایەش بکەنەوەو بیر لە دوارۆژیش بکەنەوە، تەنیا بیر لە قیامەتێ مەکەنەوە، بەڵکو بیر لە دنیایەش بکەنەوە، ماڵ‌و منداڵتان چۆن بژیەنن، چۆن بەڕێوەبچن؟

ئنجا دێتە سەر باسی چۆنیەتی مامەڵەکردن لەگەڵ هەتیوانداو دەفەرموێ: ﴿ وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْيَتَٰمَىٰ ﴾، وە پرسیارت لێ دەکەن دەربارەی هەتیوان، چۆن مامەڵەیان لەگەڵ بکەن؟ وەك لە هۆی هاتنە خوارەوەکەیدا باسمان کرد ﴿ قُلْ

﴿ إِصۡلَاحٞ لَّهُمۡ خَيۡرٞ ﴾، بڵێ: چ شتێك بۆ ئەوان چاكو پەسندەو چۆن بۆ وان چاكەو قازانجەو بەرژەوەندییە، وا بكەن، ﴿ وَإِن تُخَالِطُوهُمۡ فَإِخۡوَٰنُكُمۡۚ ﴾، ئەگەر پێویستی كردماڵەكەیان تێكەڵ بە ماڵتان بكەنو خواردنەكەیان تێكەڵ بە خواردنتان بكەن، لەگەڵتاندا بژیێن لەنێو خێزاندا وای پێویست كردو بۆ وان چاكتربوو، ئەوە براتانن، وەك چۆن لەگەڵ براتاندا مامەڵە دەكەن، ئاوا مامەڵە بكەن ﴿ وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ ٱلۡمُفۡسِدَ مِنَ ٱلۡمُصۡلِحِۚ ﴾، خواش خراپەكار لە چاكەكار دەزانێو لێكیان جیادەكاتەوە ﴿ وَلَوۡ شَآءَ ٱللَّهُ لَأَعۡنَتَكُمۡۚ ﴾، وە ئەگەر خوا ویستبای ئێوەی سەغڵەت دەكرد، وەك ئەوەی كە دەبێت هەموو شتێكیان جیابێت، كە ئەوە سەغڵەتیی تێدابوو ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٞ ﴾، خوا باڵادەستەو كاربەجێشە، شتی بێجێ ناكات، ئنجا دێتە سەر بابەتێكی دیكە.

﴿ وَلَا تَنكِحُواْ ٱلۡمُشۡرِكَٰتِ حَتَّىٰ يُؤۡمِنَّۚ ﴾، وە ئافرەتانی هاوبەش بۆ خوا دانەر، مارە مەكەن، تاكو ئیمان نەهێنن، {چونكە ئافرەتی كافر بۆ پیاوی مسوڵمان حەڵاڵ نیە، هەروەك چۆن ئافرەتی مسوڵمان بۆ پیاوی كافر حەڵاڵ نیەو ناشێ} ﴿ وَلَأَمَةٞ مُّؤۡمِنَةٌ خَيۡرٞ مِّن مُّشۡرِكَةٖ وَلَوۡ أَعۡجَبَتۡكُمۡۗ ﴾، وە كەنیزەكێكی بڕوادار چاكترە لە ئافرەتانێكی هاوبەش بۆ خوا دانەر، هەرچەند پێشی سەرسام بن، لە ڕووی جوانیی، لە ڕووی نەسەبو ڕەچەڵەكی، لە ڕووی ماڵو سامانیو لایەنی كۆمەڵایەتی، ﴿ وَلَا تُنكِحُواْ ٱلۡمُشۡرِكِينَ حَتَّىٰ يُؤۡمِنُواْۚ ﴾، وە ئافرەتیش مەدەن بە پیاوی كافرو هاوبەش بۆ خوا دانەر مەگەر ئیمان بێنن، هەتا ئەو كافرانە ئیمان نەهێنن ئافرەتیان لێ مارە مەكەن ﴿ وَلَعَبۡدٞ مُّؤۡمِنٌ خَيۡرٞ مِّن مُّشۡرِكٖ وَلَوۡ أَعۡجَبَكُمۡۗ ﴾، وە كۆیلەیەكی پیاوی ئیماندار باشترە لە پیاوێكی هاوبەش بۆ خوا دانەر، هەرچەند پێی سەرسام بن، بە سەروەتو سامانی، بە شەخصیەتی، بەلایەنی سیاسی، مادام كافرە لەڕووی خزمایەتیی لەگەڵ كردنو ئافرەت پێدانەوە، فلسێكی

قەڵب ناهێنێو، شایستەی ئەوەنیە ئافرەتانی مسوڵمان لێ مارە بکرێ ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ يَدۡعُونَ إِلَى ٱلنَّارِ ﴾، ئا ئەوانە خەڵك بانگ دەكەن بەرەو ئاگری دۆزەخ ﴿ وَٱللَّهُ يَدۡعُوٓاْ إِلَى ٱلۡجَنَّةِ وَٱلۡمَغۡفِرَةِ بِإِذۡنِهِۦ ﴾، بەڵام خوا خەڵك بانگ دەكات بەرەو بەهەشت، بەرەو لێبوردن بە ئیزنو مۆڵەتی خۆی ﴿ وَيُبَيِّنُ ءَايَٰتِهِۦ لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمۡ يَتَذَكَّرُونَ ﴾، وە بەڵگەكانی خۆی بۆ خەڵك ڕوون دەكاتەوە، بۆ ئەوەی پەند وەربگرن، ئەو حەقیقەتانەی كە خوای پەروەردگار لە ناخیاندا لە فیطرەتیاندا دایناون، بەهۆی ئایەتەكان وە بیریان بێنەوە (تذكّر) ئەوەیە كە ئینسان شتێك بزانێت، وە بیری بێتەوە، هەموو ئەو حەقیقەتانەی كە شەریعەتی خوا دەیانفەرموێ: عەقڵی سەلیم، وە فیطرەتی ساغیی ئینسان، قەبووڵیان دەكاتو هەر ئەوەی دەوێ وەبیری بێننەوە.

## چەند مەسەلەیەكی گرنگ

**مەسەلەی یەكەم:** خوای پەروەردگار كە دەفەرموێ: ﴿ يَسۡـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلۡخَمۡرِ وَٱلۡمَيۡسِرِ ﴾، پاشان دەفەرموێ:﴿ وَيَسۡـَٔلُونَكَ مَاذَا يُنفِقُونَ ﴾، دوایی دەفەرموێ: ﴿ وَيَسۡـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلۡيَتَٰمَىٰ ﴾، هەڵبەتە دوای ئەوەش دێت: ﴿ وَيَسۡـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلۡمَحِيضِ ﴾، كە لە دەرسێكی دیكەدا پێی دەگەین، وە لە دەرسی پێشووتریشدا فەرمووی: ﴿ يَسۡـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلشَّهۡرِ ٱلۡحَرَامِ قِتَالٍ فِيهِ ﴾، وە لە پێش ویشدا فەرمووی: ﴿ يَسۡـَٔلُونَكَ مَاذَا يُنفِقُونَ ﴾، وەك دەبینین لەم چەند ئایەتەدا، خوا ﷻ باسی هاوەڵانی بەڕێزی پێغەمبەر ﷺ دەكات، كە چەند پرسیارێكیان لە پێغەمبەر كردوە ﷺ جا ئایا ئەوە چی دەگەیەنێت ؟! ئەوە دەگەیەنێ كە ئەو بەڕێزانە خوا لێیان ڕازی بێ، بە تاریكاییدا نەڕۆیشتوونو بەرپێی خۆیانیان بینیوە، ئنجا هەنگاویان ناوە، وە زۆر مەبەستیان بووە ئەو شتانەی

کە دێنە پێشیان حوکمی خوایان ﷻ لەبارەوە بزانن، کە ئایا خوای بەرزومەزن ئەو شتەی بەلاوە چۆنە؟ ئەو خواردنەوەیە بخۆنەوە یان نەخۆنەوە؟ ئەو کارە بکەن یان نەیکەن؟ ئەو مامەڵەیە چۆن بکەن؟ وە دەربارەی شەراب و قومار پرسیویانە: ئایا حەڵاڵن یان حەرامن؟ هەڵبەتە پێش ئەوەی قەدەغە بکرێن، وە دەربارەی ماڵ و سامان، کە چی ببەخشن؟ دوای ئەوە کە خوا ﷻ فەرموویەتی: ماڵتان ببەخشن، پرسیاریان لە پێغەمبەر کردوە چی و چەند ببەخشن؟ وە پاشان دەربارەی هەتیوان (واتە: منداڵانی بێ باب) پرسیاریان لە پێغەمبەر ﷺ کردوە، کە چۆن مامەڵەیان لەگەڵدا بکەن؟ خوای پەروەردگاریش وەڵامی هەموو ئەو پرسیارانەی داوەتەوەو تیشکی خستوونە سەر، جا ئەمە ئەوەی لێوەردەگیرێ، کە ئینسانی مسوڵمان دەبێ بەرپێی خۆی ببینێ، ئەوجار هەنگاو بنێ، وە ئینسانی مسوڵمان و خەڵکی مسوڵمان، هەتا حوکمی شەرع دەربارەی شتێك نەزانێت، نابێت لەخۆوە هەنگاوی بۆ بنێ، چ بە باری کردن، چ بە باری نەکردندا.

**مەسەلەی دووەم:** کە هاوەڵانی بەرێزی پێغەمبەر ﷺ دەربارەی شەراب و قومار لە پێغەمبەریان ﷺ پرسیوە، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْخَمْرِ وَٱلْمَيْسِرِ ﴾، دەربارەی شەراب و قومار لێتدەپرسن، پرسیاریان لێکردوە ئەی پێغەمبەر ! ﷺ شەراب بخۆینەوە، یان نەیخۆینەوە ؟ بەردەوام بین لەسەری یان نا ؟ وە قومار بکەین یان نا ؟ بەردەوامبین یان نا ؟ ئایا ئەوە چی لێوەردەگیرێ ؟ ئەوەی لێوەردەگیرێ کە ئەو هاوەڵە بەرێزانەی پێغەمبەر ﷺ، پێش ئەوەی خوا شەرابیش قەدەغە بکات، وە پێش ئەوەی قومار قەدەغە بکات، بە عەقڵی سەلیمی خۆیان و بە فیطرەتی ساغی خۆیان، هەستیان کردوە کە شەراب خواردنەوە شتێکی خراپەو لێی لە گومان دابوون، وە هەستیان کردوە کە قومارکردن شتێکی خراپە، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە هەموو ئەو شتانەی خوا ﷻ قەدەغەی کردوون، پێش ئەوەی شەرع بڕیاریان بۆ بدات، عەقڵی سەلیم و فیطرەتی ساغ دەزانێ کە ئەو شتانە خراپن، وە

ئەو شتانەی کە خوای کاربەجێ فەرزی کردوون، عەقڵی سەلیم‌و فیطرەتی ساغ، دەزانێ کە چاکن، خواش ﷻ دەفەرموێ: ﴿...وَيُحِلُّ لَهُمُ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَيُحَرِّمُ عَلَيۡهِمُ ٱلۡخَبَٰٓئِثَ...﴿١٥٧﴾﴾ الأعراف، واتە: ئەو شتانەی کە سوودبەخش‌و بەلەززەت‌و چاکن، خوا بۆیان حەلاڵ دەکات، وە ئەو شتانەی کە پیس‌و زیانبەخشن، خوا لێیان قەدەغە دەکات.

بەڵێ خوای زاناو شارەزا هیچ شتێکی حەلاڵ نەکردوە، کە چاك‌و سوودبەخش نەبێت، وە هیچ شتێکیشی قەدەغە نەکردوە کە پیس‌و زیانبەخش نەبێت، جا جاری وا هەیە پیسیی‌و زیانبەخشیی ئەو شتەی کە خوا قەدەغەی کردوە، بۆ هەموو کەس دیارە، وە جاری وایە دیارنیە، بەڵام مسوڵمان دەبێت دڵنیا بێت، کە ئەوەی خوا قەدەغەی کردوە زیانبەخشە.

بۆ وێنە: گۆشتی بەراز خوای بە بەزەیی هەر لەوکاتەوە کە قورئانی ناردۆتە خوارو هەر لە قورئانی مەکییدا، چوار قەدەغەکراوی لە چوار شوێن لە قورئاندا ڕوون کردۆتەوە[1]: لە سوورەتی (البقرة)و سوورەتی (المائدة)و سوورەتی (الأنعام)و سوورەتی (النحل)دا ئەو چوار شتەش بریتین لە:

مردارەوەبووو، خوێن‌و، گۆشتی بەرازو، سەربڕاوێك كە ناوی غەیری خوای لەسەر هاتبێ: ﴿إِنَّمَا حَرَّمَ عَلَيۡكُمُ ٱلۡمَيۡتَةَ وَٱلدَّمَ وَلَحۡمَ ٱلۡخِنزِيرِ وَمَآ أُهِلَّ بِهِۦ لِغَيۡرِ ٱللَّهِۖ فَمَنِ ٱضۡطُرَّ غَيۡرَ بَاغٖ وَلَا عَادٖ فَلَآ إِثۡمَ عَلَيۡهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٌ ﴿١٧٣﴾﴾ البقرة، جا دیارە هەرکام لە مردارەوەبووو خوێن، ئەوە دیارە خەڵك بە سروشت ئیشتیای بۆیان ناچێ، بەڵام ئەوەی ناوی غەیری خوای لەسەر هێنرابێت، ڕەنگە زۆر دیار نەبێت، وە گۆشتی بەراز ڕەنگە زۆر دیار نەبێت، بەڵام ئێستا لەم ڕۆژگارەی ئێستادا ئەوە دەرکەوتوە کە گۆشتی بەراز جۆرە نەخۆشییەکی پێوەیە کە پێی دەگوترێ (ئەنفلەوەنزای بەراز) کە نەك جۆرێك ئەویش چەند

---

١) كە پێشتر بە وردیی باسمان لەبارەوە كردن.

جۆرێکەو لەم سەدەی (٢١)دا، حیکمەتێکی دیکەی حەرامکرانی گۆشت بەراز دەرکەوتوە، بەڵام مسوڵمانان بەهۆی نووری وەحییەوە، پێش ئەوەی زانست بەرەو پێش بچێت و زەرەرو زیانەکانی گۆشتی بەراز بدۆزێتەوە، بە حوکمی ئیمان و بڕوایان بە قورئان، خۆیان لێ بەدوور گرتوە، بۆیە مسوڵمانان لەو جۆرە نەخۆشییانە و لەو جۆرە دەردو بەڵایانە کە بەهۆی ئەو خواردنە پیس و حەرامەوە پەیدادەبن، پارێزراو دەبن، ئنجا بێگومان سەربڕاوی ناوی غەیری خوا لەسەرهێنراویش، وێڕای زەرەرو زیانی مەعنەویی، زیانی ماددیی و جەستەییشی هەر هەیە زانرابێ یان نا، وە بزانرێ یان نا ؟!

**مەسەلەی سێیەم:** دەربارەی شەڕاب (الخَمْر) کە خوا پەروەردگار بە چوار قۆناغ قەدەغەی کردوە.

## قۆناغەکانی قەدەغەکرانی شەڕاب

**قۆناغی یەکەم:** خوای پەروەردگار لە سووڕەتی (النحل) ئایەتی ژمارە (٦٧)دا، ئاماژەیەکی سووك دەكات بەوە کە شەڕاب شتێکی خراپەو مەی خواردنەوە شتێکی خراپە، دەفەرموێ: ﴿ وَمِن ثَمَرَٰتِ ٱلنَّخِيلِ وَٱلۡأَعۡنَٰبِ تَتَّخِذُونَ مِنۡهُ سَكَرٗا وَرِزۡقًا حَسَنًاۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةٗ لِّقَوۡمٖ يَعۡقِلُونَ ۝٦٧ ﴾، واتە: لە بەروبوومی دارخورماو ترێ (مێو)، شەڕابی لێ دروست دەکەن و ڕزقێکی باشیشی لێ دروست دەکەن {واتە: مێوژو دۆشاوو سرکەو... هتد}، بێگومان لەوەدا نیشانە هەیە بۆ کەسانێك کە بفامن، کە ئەمە ئاماژەیە، بۆ خراپیی شەڕاب، چونکە خوا دەفەرموێ: لە بەری دارخورماو بەری مێو، دوو شت دروست دەکەن:

یەکەم: ماددەیەکی سەرخۆشکەر.

دووەم: ڕزق و ڕۆزییەکی باش، کەواتە: ئەو ماددە سەرخۆشکەرە ڕزقێکی چاك نیەو خراپە، دیارە ئەوەش لە قۆناغی مەککەدا بووە، کە جارێ خوای کاربەجێ حوکمە شەرعییەکانی نەناردوونە خوارێ، تاکو بفەرموێ: شەڕاب مەخۆنەوە، نەشدەگونجا لەو قۆناغەدا قەدەغە بکرێ

بەپێی حیکمەتی خوای زانا، چونکە پێش ئەوەی خەڵك حەڵاڵو حەرامی بۆ دیاری بکرێ، دەبێ ئیمانو عەقیدەی هەبێو عیبادەتی هەبێو خوای پەروەردگاری ناسیبێو، بڕوای بە دوارۆژبێو بەرچاوی ڕۆشن بووبێتەوە، ئنجا پێی بگوترێ: وابکەو وامەکە، قۆناغی یەکەم ئەم ئایەتە بوو.

**قۆناغی دووەم:** ئەو ئایەتەی کە لەو چەند ئایەتە دایە، کە ئێمە خەریکی تەفسیرکردنیانین، کە دەفەرموێ: ﴿ يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْخَمْرِ وَٱلْمَيْسِرِ ۖ قُلْ فِيهِمَآ إِثْمٌ كَبِيرٌ وَمَنَٰفِعُ لِلنَّاسِ ...﴿٢١٩﴾ ﴾ البقرة ، واتە: دەربارەی شەڕابو قومار پرسیارت لێدەکەن: بڵێ گوناهێکی گەورەیان تێدا هەیەو هەندێ سوودو کەڵکیشیان تێدا هەن، بۆ خەڵکی، کە ئەمەش ئاماژەیەکی دیکەی بەقوەتترە، کەواتە: شەڕابو قومار گوناهێکی گەورەیان تێدا هەیەو هەندێ وردە قازانجیشیان تێدا هەن، بەڵام دیسان خوا نەیفەرمووە: مەیخۆنەوە، بەس ئەوەی زۆر عاقڵو لێزان بووبێ، هەر بە ئایەتەکەی سووڕەتی (النحل) کە دەفەرموێ: لە ترێو خورما ماددەی سەرخۆشکەرو ڕزقێکی باشی لێ دروست دەکەن، کەواتە: دیارە شەڕاب ڕزقێکی باش نیە، هەر ئەوەندە بۆخۆی کەسانێك عەقڵیان بەقوەت بووبێ، بەڵگە بووە بۆ ئەوەی خۆیانی لێ دووربگرن، ئنجا ئەوەی پێشتریش حاڵی نەبووبێ بە ئایەتی سووڕەتی (البقرة) لێی حاڵی بووە، کە دیارە شەڕابو قومار گوناهێکی گەورەیان تێدا هەیە.

**قۆناغی سێیەم:** خوای بێ وێنە لەو ئایەتەی سووڕەتی (النساء)دا دەفەرموێ: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَقْرَبُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَنتُمْ سُكَـٰرَىٰ حَتَّىٰ تَعْلَمُوا۟ مَا تَقُولُونَ ...﴿٤٣﴾ ﴾، واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە توخنی نوێژ مەکەون بە سەرخۆشیی، هەتا دەزانن چی دەڵێن، چونکە ئینسانی سەرخۆش نازانێ چی دەڵێ، ئەمجارەش خوای کاربەجێ نەیفەرمووە: مەیخۆنەوە، بەڵکو فەرموویەتی: بە سەرخۆشیی نوێژمەکەن، ئنجا مادام

سەرخۆشییش تا چەند سەعات (وەك سەرخۆشەكان دەڵێن) بەری نادات، مانای بۆیان نەبووە، كە لە نێوان نوێژی نیوەڕۆو عەصر، یان شێوانو خەوتنانـدا بخۆنەوە، كەواتە: دوو دەرفەتیان هەبووە: لە دوای نوێژی بەیانی تاكو نیوەڕۆ، دەفەتێك بووە، وە لە دوای نوێژی خەوتنانیش تاكو بەیانی، دەرفەتێك بووە، واتە: خوا ماوەی شەڕاب خواردنەوەی زۆر لێی تەسك كردوونەتەوە، پێش ئەوەی یەكجاریی لێیان قەدەغە بكات.

**قۆناغی چوارەم:** ئەو ئایەتەی سووڕەتی (المائدة) بوو، كە خوای پەروەردگار شەڕابو قوماری لەگەڵ بتپەرستییدا باسكردنو یەكجاریی لێی قەدەغەكردن، كە دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّمَا ٱلۡخَمۡرُ وَٱلۡمَيۡسِرُ وَٱلۡأَنصَابُ وَٱلۡأَزۡلَٰمُ رِجۡسٞ مِّنۡ عَمَلِ ٱلشَّيۡطَٰنِ فَٱجۡتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ٩٠﴾ المائدة، واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! بێگومان شەڕابو قومارو بت صەنەمەكان زەلەمەكان {(أزلام): كە بۆ یانسیب بەكاریان هێناوە} پیسن لە كردەوەی شەیتانن، خۆتانیان لێ بەدووربگرن، بۆ ئەوەی سەرفرازبن. جا نەفامی وا هەیە دەڵێ: خۆ خوا لەوێشدا نەیفەرمووە: شەڕاب مەخۆنەوە، بەس فەرموویەتی: خۆتانیان لێ دووربگرن! بەڵام بێگومان خۆ دوورگرتن زۆر بەقوەتترە لەوەی بڵێ: مەیخۆوە، چونكە لێرە كە فەرموویەتی: خۆتانی لێ دووربگرن، واتە: مەیكڕن، مەیفرۆشن، لەو مەجلیسە دامەنیشن كە تێیدا دەخورێتەوە، ڕەفاقەتی ئەوانە مەكەن، كە دەیخۆنەوە، خۆ لێ دوورگرتن هەر تەنیا خواردنەوەكەی ناگەیەنێ، بەڵكو زۆر شتی دیكەش دەگەیەنێ، كە هەموویان حەرامن، وەك لە فەرمایشتی پێغەمبەردا ﷺ هاتوە، كە دوایی ئاماژە بە هەندێكیان دەكەین.

## قۆناغەكـانی قەدەغەكـردنی قومار

**قۆنـاغی یەكـەم:** خـوای پەروەردگـار لـە سـوورەتی (النسـاء)دا، ئـەم ئایەتـەی نـاردە خـوارەوە: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَأْكُلُوٓا۟ أَمْوَٰلَكُم بَيْنَكُم بِٱلْبَـٰطِلِ إِلَّآ أَن تَكُونَ تِجَـٰرَةً عَن تَرَاضٍ مِّنكُمْ ۚ وَلَا تَقْتُلُوٓا۟ أَنفُسَكُمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِكُمْ رَحِيمًا ﴿٢٩﴾ ﴾، واتـە: ئـەی ئەوانـەی بڕواتـان هێنـاوە ! مـاڵی خۆتـان لـە نێوخۆتانـدا بـە ناهـەق مـەخۆن، مەگـەر بازرگانییـەك بێـت بـە ڕەزامەنـدیی هـەردوولا ئـەنجامی بـدەن، وە خۆتـان مـەكوژن بێگومـان خـوا لەگەڵـتاندا بـە بـەزەییە، ماڵـی خۆتـان بە ناهـەق مەخـۆن، یانی: چی؟ بێگومان قومار ماڵـی یەكدی خواردنە بە ناهـەق، چونكە یەكیان بە چـەند خولـەكێك ئـەوی دیكـە قەلـۆش دەكـاتو، هـەموو پـارەو موڵـك سـامانەكەی لـێ دەباتـەوە ! ئەمـە ئاماژەیـەك بوو بە قەدەغـەبوونی قومار.

**قۆناغی دووەم:** باسـكردنی قومـار بوو لەگـەڵ شـەڕابدا، ئـەویش لـەو ئـایـەتـەدا، كـە دەفـەرموێ: ﴿ يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْخَمْرِ وَٱلْمَيْسِرِ ۖ قُلْ فِيهِمَآ إِثْمٌ كَبِيرٌ وَمَنَـٰفِعُ لِلنَّاسِ ...﴿٢١٩﴾ ﴾البقـرة، كـە بەڕاشـكاویی فەرموویـەتی: گونـاهی گـەورەیان تێـدایەو زیانیـان لە قازانجیان زلـترە.

**قۆنـاغی سـێیەم:** بریتیـە لـە ئایـەتی ژمـارە (٩٠) لـە سـوورەتی (المـائدة)دا، كـە دەفـەرموێ: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِنَّمَا ٱلْخَمْرُ وَٱلْمَيْسِرُ وَٱلْأَنصَابُ وَٱلْأَزْلَـٰمُ رِجْسٌ مِّنْ عَمَلِ ٱلشَّيْطَـٰنِ فَٱجْتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴾، كە پێشـتریش هێنـاومانەتەوە.

جا لێرەدا دەپرسین: ئایـا حیكمـەتی چییـە، كـە خـوا ﷻ شـەڕابی بـە چـوار قۆنـاغ قەدەغـە كـردووەو، قومـاری بـە سـێ قۆنـاغ قەدەغـەكردووە؟ حیكمەتەكـەی ئەوەیە كە ئـەو شـتانەی دەبـن بـە عادەتێكـی ڕیشـەدار لـەنێو كۆمەڵگـاو لـەنێو خەڵكدا، وە خەڵـك لەسـەریان ڕا دێ، وە چەنـد جیل لەسەریان پـەروەردە دەبـن،

بە نووکە قەڵـەمێك ناگونجـێ قەدەغـە بکـرێن‌و دەبێـت پێـشەکی‌و زەمینـە سازییان بۆ بکرێ‌و پلە پلە بێت، خـواش ﷻ زانـاو کاربـەجێیەو، زانیویـەتی کە ئەو خەڵکە بە شەڕاب خواردنەوەوە ڕاهاتوەو، بە قومارکردن ڕاهاتوە، بەڵکو هەندێکیان هەر ژیـان‌و کـارو کەسـابەتیان بـریتی بـووە لـە بازرگانییکردن بـە شـەڕاب‌و هێنـان‌و بردنـی‌و، قومـارکردن، بۆیـە خـوا ﷻ بەیـەك جـار بڕیـاری نەداوەو، بە چوار قۆنـاغ بڕیاریـداوە، تـاکو وردە وردە زەمینەسازیی بـۆ بکـرێ، لەڕووی دەروونیـی کۆمەڵایەتیـی لـەڕووی ئابووریـی... هتـد، ئنجـا بڕیـاری یەکـجارەکیی داوە، وە شـەریعەتی خـوای کاربەجـێ نـەك هـەر لـەوەدا، لـە زۆر شتی دیکەشـدا هەنگاو هەنگـاوو پلـە پلـە بڕیارەکانـی خۆی دەرکـردوە، چونکە ئاوا چاکتـر خەڵـك بۆی جێبەجێ دەکرێن.

**مەسـەلەی چوارەم:** ئـەوە کـە دەفـەرموێ: ﴿ وَإِثْمُهُمَآ أَكْبَرُ مِن نَّفْعِهِمَا ﴾، واتـە: گونـاهی شـەڕاب‌و قومار گـەورەترە لە سوودەکـانیان، یەکێك بۆی هەیە بپرسـێ: ئەوە گوناهـەکەیان‌و زەرەرو زیانەکانیان دیـارن، بـەڵام سوودەکانیان چین ؟! لـە وەڵامـدا دەڵـێین: سوودەکانیان چەند شـتێك بوون:

**یەکـەم:** بە نسبەت شـەڕاب بازرگـانییان پێکـردوە.

**دووەم:** کـابرای سـەرخۆش، دەڵـێن: جۆرێـك لـە خـەیاڵی بـۆ دێـت‌و دەچـێتە دنیایەکی دیکـەوە.

**سێیەم:** بـە نـسبەت قومـارەوە، بابـایەك، کـە پارەیەکـی زۆر دەباتـەوە بـەبێ مانـدووبوون، بەهۆیـەوە جۆرێـك لـە شـادیی‌و دڵخۆشـیی درۆزنانـەی بـۆ پەیدادەبێ‌و، سوودو قازانجەکانی لەو ڕووەوەن، ئەگەرنا نە شەڕاب نە قومـار نە بۆ عەقڵ باشـە، نەبۆ جەستە باشـە، نە بۆ مـاڵ باشـە، نـە بـۆ دنیـا باشـە، نـە بـۆ قیامـەت باشـە، بـەڵام سـوودو کەڵـکەکانیان لـەو جـۆرو بابەتـەن، کە ئاماژەمان پێدان‌و پێشتـریش ئاماژەمان پێدابوون.

**مەسـەلەی پێنجـەم:** زیانـەکانی شـەڕاب، ئێمـە نـاتوانین باسـی هـەموویان بکـەین، بەڵام دەتوانین بە کورتی ئاماژە بە هەندێ لە زیانەکانی بکەین:

١/ شەراب دەبێتە هۆی پەیدابوونی کۆمەڵێك نەخۆشیی، وە هەموو پسپۆڕو شارەزایانی تەندروستیی لەسەرئەوە یەکدەنگن، کە شەراب خۆرەکان هەمیشە زیاتر لە خەڵکی دیکە، ئەوانەی کە شەراب ناخۆنەوە، گیرۆدەی کۆمەڵێك دەردو نەخۆشیی دەبن، وەك چۆن جگەرەکێشان کۆمەڵێك نەخۆشیی‌و دەردی لێ دەکەوێتەوە، کە خەڵکی جگەرەنەکێش لەو شتانە دوورن.

٢/ خراپییەکی دیکەی شەراب خواردنەوە، ئەوەیە کە شەرابخۆرەکان نوقسانیی لە منداڵەکانیاندا پەیدادەبێ، لەڕووی جەستەیی‌و عەقڵیی‌و دەروونیەوە.

٣/ زیانێکی دیکەی مەیخۆریی، ئەو ڕەوشتە دزێوو خراپانەن کە لە شەرابخۆردا پەیدادەبن، وەك دڵڕەقیی‌و بێ شەخصیەتیی‌و سووك بوون، وە ئەوانەی کە موعتاد دەبن‌و ڕادێن لەسەر شەراب خواردن‌و بەکارهێنانی ماددە سڕکەرەکان، سووکترین شت ئەنجام دەدەن بەس تۆزە شەرابێکیان دەست بکەوێ، وە بابای خووگرتوو بەو شتانەوە، ئامادەیە هەموو شتێك بکات بەس حەبێکی دەستبکەوێ، یان دەرزییەکی دەستبکەوێ بەکاری بێنێ.

٤/ وە لەڕووی کۆمەڵایەتیی یەوە، شەراب خواردنەوە زۆر نەخۆشیی کۆمەڵایەتیی لێ دەکەونەوە، چەندان ژن‌و مێرد لەیەك جیادەبنەوەو لەسەر ئەوە شەڕ پەیدا دەبێت‌و منداڵ هەڵوەدا دەبن‌و خێزان هەڵدەوەشێت.

٥/ وە لەڕووی ڕوودانی کارەسات‌و تاوانەوە، زۆرجار کابرا لەکاتی سەرخۆشییدا خەڵك دەکوژێ، دزیی دەکات، یان شوفێرە دەعەم بە سەیارەکەی دەکات‌و لەبەین دەچێ، ئەو شتانە زۆر ئاشکران‌و، لە ژیانی ئەو جۆرە کەسانەدا بە زەقیی دەبینرێن.

٦/ وە لەڕووی ئابوورییەوە، بابای شەراب خۆر بە زۆریی وایە، کە موعتاد (مدمن) دەبێت‌و، لەسەری بەردەوام دەبێت، سەرەنجام وای لێدێت هەموو ماڵ‌و سەروەت‌و سامانی خۆی لەسەر دادەنێت!

## زیانـەکـانی قومـار

١- یەکێك لە زیانەکنی لەڕووی جەستەیی‌و دەروونییەوە، بریتیە لە هەڵچوون (إنفعال)، کابرا لەناکاو دەدۆڕێنێ، تووشی شۆك بوون‌و صەدمەی نەفسیی دەبێت، یان لەناکاو دەباتەوە پارەیەکی زۆری دێتە دەستی، دیسان تووشی هەڵچوونێکی دەروونیی دەبێت‌و، پزیشکەکانیش لەسەر ئەوە یەکدەنگن کە ئەوانەی لەناکاو زۆر دڵخۆش دەبن، یان لەناکاو زۆر دڵتەنگ دەبن، تووشی نەخۆشیەکانی: زەخت‌و شەکرەو برینی گەدەو دوازدەگرێ، دەبن، بەڵکو جاری وابووە کابرا لە ئەنجامی دۆڕاندنێکی گەورەدا، دڵی وەستاوە، یان لە ئەنجامی بردنەوەیەکی گەورەدا دیسان جاری وایە هێندە دڵخۆش دەبێت تەحەممول ناکات، بەتایبەتی کە لایەنی ئیمانییشیان بەقوەت نیە.

٢- وە لەڕووی ئابوورییەوە، بە زۆریی ئەوانەی کە قومار دەکەن، سەرەنجام تووشی ئیفلاس‌و ماڵوێرانیی دەبن‌و، ئەو حاڵەتانەش زۆرن.

٣- وە لەڕووی کۆمەڵایەتییەوە، زۆرجار ئەوانەی قومار دەکەن، لەگەڵ یەك تووشی دەمەقرەو دەمەقاڵێ‌و شەڕە قسە، بەڵکو شەڕە چەقۆو یەکدی کوشتن‌و ئەوانە لە نێوانیاندا ڕوودەدات‌و، کەتن‌و تاوانی زۆر لەو ڕێیەوە پەیدا دەبێ.

٤- وە لەڕووی خێزانییەوە، دیسان کابرا کە قومار دەکات بەزۆریی لەسەر حیسابی ماڵ‌و منداڵەکەیەتی، بەڵکو هەبووە ماڵ‌و منداڵەکەشی دۆڕاندوەو دەڵێن: هی وابووە لە قوماردا خێزانەکەی دۆڕاندوە! کەواتە: بۆیە خوای بەرزو مەزن ئەوانەی قەدەغە کردوە کە بە تەئکید لە هەموو ڕوویەکەوە زەرەرو زیانی زۆریان تێدایە، بۆیە دەبێ وریا بین، کە خوا دەفەرموێ: ﴿ فِيهِمَآ إِثۡمٞ كَبِيرٞ وَمَنَٰفِعُ لِلنَّاسِ ﴾، ئەو (منافع)ە، کە ئەو وردە قازانجە ماددیانەن، کە لە کۆمەڵگای داڕوخاوو ناشەرعییدا وەدەست دێن، وەك ئێستا کەسانێك هەنە لە پەنای بازرگانیی کردن بە مادده سەرخۆشکەرەکاندا

قازانجی زۆر دەکەن، چونکە لە هەموو دەوڵەتاندا ماددە سەرخۆشکەرەکان قەدەغەن، ئنجا کابرا کە دەیهێنێ‌و دەیبا قازانجی چی لێدەکات، قازانجی ماددیی لێدەکات، بەڵام بە تەئکید زەرەرێکی مەعنەویی گەورە لە کۆمەڵگاکەی‌و لە خۆشی دەدا، لە دنیاو قیامەتدا.

**مەسەلەی شەشەم:** پێویست بەوە دەکات ئێمە پێناسەیەکی شەراب بکەین، مەی (الخَمْر) چییە؟ ئایا دەبێ حەتمەن لە خورما دروست کرابێ، یان لە جۆ، یان لە ترێ ؟! نەخێر، وەك پێغەمبەر ﷺ لە فەرموودەیەکدا فەرموویەتی: {عَنْ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُما، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ كُلُّ مُسْكِرٍ خَمْرٌ، وكُلُّ مُسْكِرٍ حَرَامٌ، وَمَنْ شَرِبَ الخَمْرَ في الدُّنيا، فَمَاتَ وَهُوَ يُدْمِنُهَا، ولَمْ يَتُبْ، لَمْ يَشرَبْهَا في الآخِرَةِ} رَوَاهُ مُسلم، برقم: (٥١٨٦)، واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر خوا لێیان ڕازی بێ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەموو سەرخۆشکەرێك شەرابە {کە دەفەرموێ: هەموو سەرخۆشکەرێك، واتە: چ بە شێوەی خواردنەوە بێت، چ بە شێوەی خواردن بێت، چ حەب، چ دەرزی لێدانبێ، چ بە شێوەی دووکەڵ بێت، کە دەسووتێنرێ‌و بۆنی دەکەن، ئەوانە هەمووی دەگرێتەوە}، وە هەموو سەرخۆشکەرێکیش حەرامە، وە هەرکەسێك شەراب لە دنیادا بخواتەوە {بەزۆریی ئەوکاتە بەس حاڵەتی خواردنەوەی هەبووە}، وە بمرێ لە حاڵێکدا کە لەسەر خواردنەوەی بەردەوامە، وە تۆبەی لێنەکات، لە دواڕۆژدا نایخواتەوە، واتە: ئەگەر مسوڵمانیش بێت‌و بایی ئەوەندە ئیمان‌و طاعەتیشی هەبێت بچێتە بەهەشتێ، خوای دادگەر لە دواڕۆژدا بێبەشی دەکات لە شەراب خواردنەوە، وە دەشگونجێ مەبەستی پێغەمبەر ﷺ ئەوەبێ کە هەر ناچێتە بەهەشتێ، چونکە کەسێك هەر بەردەوام بێت لەسەر ماددە سەرخۆشکەرەکان ناشیپەرژێتە سەر طاعەت، یاخود ناتوانی لەسەری بەردەوام بێت، ئەگەر ئیمانی هەبێ، واتە: مەبەستی ئەوەیە کە هەرناچێتە بەهەشت، چونکە کە نەچووە بەهەشت ئەوکاتە ئەو نیعمەتانەی کە لە بەهەشتن، مانای وایە

لێیــان مەحرووومــە، وە دەشگونجــێ مەبەســت ئــەوە بــێ کــە بــۆ ماوەیــەکی دیاریکراو لێی قەدەغە دەکرێ ، وەك سزایەك، نەك یەکجارەکیی.

هەروەها لـە فەرموودەیـەکی دیکەدا هاتوە کـە پێغەمبـەر ﷺ فەرموویـەتی: {(كُـلُّ شَـرَابٍ أَسْـكَرَ، فَهُـوَ حَـرَامٌ) (رَوَاهُ مُـسلم بـرقم: (٥١٧٩)، عَـنْ عائِـشَةَ رَضِـيَ اللهُ عَنْهَـا }، واتـە: هـەر خواردنـەوەیـەك ئینـسان سـەرخۆش بکات، ئـەوە قەدەغەیە، (هەر شتێك بێتو لە هەرشتێك دروست کرابێ)، ئنجا یەکێك ڕەنگە بڵێ: باشە ئەگەر کابرا دوو دڵۆپان بخواتەوە،یاخود قومێکی بخواتەوە سەرخۆش نەبێت، ئەوە چۆنە؟ لە وەڵامی ئەوەشدا پێغەمبەر ﷺ ئەم حەقیقـەتەی ڕوون کردۆتـەوەو فەرموویـەتی: {(مَـا أَسْكَـرَ كَثِيـرُهُ فَقَلِيلُـهُ حَـرَامٌ) رَوَاهُ أَبُـو دَاوُدَ برقم: (٣٦٨١)، عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِاللهِ رضي الله عنه، وَصَحَّحَهُ الألبانـي فـي (سُنَن أبـي داود)}، واتە: هەرشتێك بەزۆری سەرخۆشبی، کەمیشی حەرامە، بەڵام بێگومـان گوناهی کـەم سزای لەقـەدەر خۆیو، هی زۆریش لەقـەدەر خۆیـەتی.

**مەسـەلەی حەوتـەم:** دەربارەی ئـەوە کـە، چ شتێك لـە مـاڵی خۆیـان ببەخـشن ؟!

هـاوەڵان پرسـیاریان لـە پێغەمبـەر کـرد ﷺ، نـەیانزانی ماڵەکـەیان هـەموو ببەخـشن، یـان نیوەی ببەخـشن، یان چەندی ؟ خـوای پەروەردگـار دەفـەرموێ:

﴿ وَيَسْـَٔلُونَكَ مَاذَا يُنفِقُونَ قُلِ ٱلْعَفْوَ ﴾، لێـت دەپرسـن چـی ببەخـشن؟ چـی بکەنـە خێـر؟ بڵـێ: ئەوەی کـە زیـادە، واتە: ئەوەی لە پێداویستیی خۆتان زیادە، بەڵام بۆ خۆت پەکت لەسەری کەوتبێ، ئەوە نەك لەسەرت پێویست نیە، بەڵکو زۆر جار هەر پەسـندیش نیە بیکەی بەخێر، تۆ بۆخۆت پەکت لەسەری بکەوێ، بچی خێریش بکەیو دوایی چاوت لەدەسـتی خـەڵکی بـێو سـواڵ بکـەی، یـاخود چـاوت لـە دەسـتی خـەڵکی بـێ، مانـای وایـە هیـچت نـەکرد، جـا لـەوباوەڕە ئـەو فەرموودەیـە هەیـە، کـە یەکێـك لـە هـاوەڵان دەچێتە خزمـەت پێغەمبـەر ﷺ دەڵێ: ئەی پێغەمبەری خوا چۆن خێر بکەمو مـاڵی خـۆم ببەخـشـم ؟ ئەویـش فەرموویەتی: {(ابْدَأْ بِنَفْسِـكَ فَتَصَـدَّقْ عَلَيْهَـا، فَإِنْ فَضَـلَ شَـيءٌ فَـلأَهْـلِكَ،

فَإِنْ فَضَلَ عَنْ أَهْلِكَ شَيْءٌ، فَلِذِي قَرَابَتِكَ، فَإِنْ فَضَلَ عَنْ ذِي قَرَابَتِكَ شَيْءٌ، فَهَكَذا وَهَكَذا) (رَوَاهُ مُسلم برقم: (٢٣١٠)}، واتە: پێشی بەخۆت دەستپێبکە {چاکەت لەگەڵ خۆت بکەو لەو ماڵو سامانەی کە هەتە پێداویستییەکانی خۆتی پێ جێبەجێ بکە}، جا ئەگەر شتێك زیاد بوو، با بۆ خێزانت بێ {ئەوەی کە نەفەقەیان لەسەر تۆ واجبە، دیارە بابو دایك، پێش هەموویان}، ئنجا ئەگەر لە شتێك زیاد بوو، با بۆ خزمەکانت بێ، وە ئەگەر شتێك لە خزمەکانیشت زیاد بوو، ئنجا بەملاداو بەولادا، واتە: بۆ خەڵکی دیکە خەرجی بکە، کەواتە: ئینسان دەبێت ڕیزبەندیی دابنێ بۆ خێرو ماڵو بەخشینو، لە گرنگترەوە بۆ گرنگ بچێو، پێشی هەموو کەس بۆخۆت، ئنجا ماڵو خێزانت، ئنجا خزمان، ئنجا پێ بە پێ، کەسانی ئاتاج کە لە کۆمەڵگادا هەن: هەتیوان، هەژاران، نەداران، لێقەوماوان، ... هتد.

**مەسەلەی هەشتەم:** بەنسبەت بەخێوکردنی منداڵی هەتیوەوە، کە پێشتر باسمان کرد، هاوەڵانی بەڕێزی پێغەمبەر ﷺ پرسیاریان لە پێغەمبەری خوا کرد: چۆن مامەڵە لەگەڵ هەتیودا بکەن؟ دوای ئەوەی چەند ئایەتێك هاتنە خوارێ کە: توخنی ماڵی هەتیو مەکەون، ئەوانیش هەڵدەستان ماڵو سامانو خواردنو خواردنەوەی هەتیوان کە لەلایان بوو، جیایان دەکردەوە، بەجیا خواردنیان بۆ ساز دەکردنو لێیان نەدەخوارد، وە جاری وا هەبوو منداڵەکان پێیان نەدەخوراو خەسار دەبوو، خوای کاربەجێ دوای ئەوە ئەم ئایەتە ناردە خوارێ: ﴿وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْيَتَـٰمَىٰ ۖ قُلْ إِصْلَاحٌ لَّهُمْ خَيْرٌ ۖ وَإِن تُخَالِطُوهُمْ فَإِخْوَٰنُكُمْ﴾، پرسیارت لێدەکەن چۆن مامەڵە لەگەڵ هەتیوان بکەن؟ بڵێ چۆن بۆ ئەوان پەسندەو چۆن بەرژەوەندییە، ئەوە باشترە وا بکەن، وە ئەگەر لەگەڵیشیان تێکەڵ بوونو ماڵو سامانی خۆتان لەگەڵ هی واندا تێکەڵ کرد، ئەوە براتانن، واتە: فەرقیان پێ مەکەن، وە با ماڵی وان بەلای هی ئێوەدا نەیەت، وە پێغەمبەر ﷺ لەبارەی گەورەیی پاداشتی بەخێوکردنی هەتیوەوە،

فەرموویەتی: {(أنَا وَكَافِلُ اليَتِيمِ فِي الجَنَّةِ كَهَاتَيْنِ، وأشَارَ بالسَّبابة والوُسطَى وفَرَّق بَيْنَهُمَا) (رَوَاهُ البُخَارِيُّ برقم: (٥٣٠٤)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٥١٥٠)}، واتە: منو کەسێك کە هەتیو بەخێو دەکات لە بەهەشتێدا ئاواین، وە ئیشارەتی کرد بە پەنجەی شایەتمانیو پەنجەی نێوەڕاستیو پەنجەکانیشی لەیەك جیاکردەوە، واتە: ئەگەر پەنجەی شایەتمان کابرابێ، پەنجەی نێوەڕاست پێغەمبەرە ﷺ، پێغەمبەری خوا پلەی لەو بەرزترە، ئەگەرنا ئەویش هەر لە بەهەشتێیە، واتە: پلەیەکی زۆر گەورەی هەیەو بەخێوکردنی منداڵی هەتیوو سەرپەرشتیکردنی بە دڵسۆزییەوە، عیبادەتو طاعەتێکی زۆر گەورەیە، ئنجا لێرەدا هەڵەیەك هەیە دەمەوێ ڕاستی بکەمەوە بۆ هەندێك لە مسوڵمانان:

هی وا هەیە پێی وایە هەتیو هەموو شتێکی حەرامەو هەر ماڵێك منداڵی گچکەی هەتیوی لێبوون، نابێ بچێتە سێبەرێ خانووشیانو، نابێ ئاویشیان لە ماڵدا بخواتەوە! بەڵام بێگومان ئەم قسانە هیچ نین، چونکە خوای زاناو توانا بە دەقی ئایەت فەرموویەتی: ﴿ وَإِن تُخَالِطُوهُمْ فَإِخْوَانُكُمْ ﴾، واتە: وە ئەگەر لەگەڵیان تێکەڵ بنو تێکەڵییان بکەنو، ماڵو منداڵو سامانی وان لەگەڵ هی خۆتان تێکەڵ بکەن، ئەوە براتانن، ﴿ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ ٱلْمُفْسِدَ مِنَ ٱلْمُصْلِحِ ﴾، وە خواش دەزانی کێ چاکخوازەو کێ خراپەکارە، کەواتە: ئەگەر تۆ ماڵو سامانی خۆت لەگەڵ هی منداڵە هەتیوەکە تێکەڵ بکەیو، لەگەڵ هی خۆت کەسابەتی بۆ بکەیو، نانو چێشتی لەگەڵ هی خۆت بۆ سازبکەی، ئەگەر زەرەری لێبدەی، ئەوە خوا دەتناسێو ئەگەر، بۆ ئەوەشت نەبوو زەرەری لێبدەیو، مەبەستت قازانجو بەرژەوەندیی ئەوبێ، ئەوە خوای بەرز ئاگادارە، کەواتە: توخنکەوتنی ماڵی هەتیو کاتێك حەرامە کە بە شێوەیەکی خراپو زیانلێدەرانە بێ، هەربۆیەش، خوا فەرموویەتی: ﴿ وَلَا تَقْرَبُوا۟ مَالَ ٱلْيَتِيمِ إِلَّا بِٱلَّتِي هِيَ أَحْسَنُ ... ﴿١٥٢﴾ ﴾ الأنعام، واتە: وە نزیکی ماڵی هەتیو مەکەون، مەگەر بەچاکترین شێوە، واتە: بەشێوەیەك کە بۆ ئەو باش بێت، ئەگەر بۆ ئەو باش

بوو، قەیناکات کەسابەتی بۆ دەکەی، لەگەڵ هی خۆت چێشتی بۆ لێدەنێی، لەگەڵ منداڵەکانی خۆت سەرپەرشتی دەکەی، یان کاتێك دەچی بۆ ماڵێك هەتیویان هەن، چایەکیان لە ماڵێ دەخۆیەوە، ئەگەر بۆیە دەچی دڵیان خۆشبکەی، دوو ئامۆژگارییان بکەی، ئەوە قەیناکات، هەرچەندە ئەوەی کە دەچێ شتێکیان لە ماڵێ دەخوات، دەتوانێ سوودێکیان هەر پێ بگەیەنێ، سوودێکی مەعنەویی یان ماددیی، ئەوکاتە ئەو چایی خواردنەوەیە بە حەرام دانانرێ، چونکە تۆ نەتویستوە زیانیان پێبگەیەنی، بەڵکو ویستوتە قازانجیان پێ بگەیەنی، ئنجا ئەگەر بەو جۆرە بیرکردنەوەیە بێو هەر ماڵێك منداڵی هەتیوی هەبوو، بێوەژنێك کە منداڵی هەتیوی هەن، کەس نەچێتە سێبەری خانووی‌و، کەس ئاوێك لە ماڵیان نەخواتەوەو لە ماڵیان دانەنشێ مانای وایە زەرەر دەکەن‌و دادەبڕێن لە کۆمەڵگا بۆیە ئەوە شتێکی زۆر غەڵەتەو، هەندێك مەلاو خەڵکی نەشارەزا لە دین، ئەو شتانەیان ڕەواج پێداوە، ئەگەرنا بە پێچەوانەوە، ماڵێك کە منداڵی هەتیویان هەن، دەبێ خزم‌و دراوسێ زیاتر هاموشۆیان بکەن، گرنگ ئەوەیە مەبەستیان ئەوە نەبێت کە زەرەر بە ماڵی هەتیوەکە بگەیەنن‌و، بچن لەوێ دەعوەت بن‌و شت لە ماڵیان بخۆن بەبێ قەرەبووکردنەوە! بەڵکو مەبەستیان ئەوە بێت، قازانجیان پێ بگەیەنن، جا ئەگەر لە پەنای ئەو قازانج پێ گەیاندنەدا، چایەکیش لەماڵیان بخۆن‌و بێ بەرانبەریش بێت، بە تەئکید حەرام نیە.

**<u>مەسەلەی نۆیەم</u>:** کە دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تَنكِحُوا۟ ٱلْمُشْرِكَٰتِ حَتَّىٰ يُؤْمِنَّ ﴾، کە واتە: وە ئافرەتانی بتپەرست‌و هاوبەش بۆ خوا دانەر، مارە مەکەن هەتا ئیمان نەهێنن، جا لێرەدا پرسیارێك دێتە پێش: ئایا ئافرەتی جوولەکە، یان ئافرەتی نەصڕانیی، کە (خاوەن کتێب)یان پێدەگوترێ، ئایا ئەوانیش وەبەر ئەم ئایەتە دەکەون‌و دروست نیە ئەوانیش بێنین؟ لە وەڵامدا دەڵێین: نەخێر وانیە، چونکە خوای تاك‌و پاك لە سووڕەتی (المائدة)دا دەفەرموێ: ﴿ ٱلْيَوْمَ أُحِلَّ لَكُمُ ٱلطَّيِّبَٰتُ ۖ وَطَعَامُ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ حِلٌّ لَّكُمْ وَطَعَامُكُمْ حِلٌّ لَّهُمْ ۖ وَٱلْمُحْصَنَٰتُ

مِنَ ٱلْمُؤْمِنَٰتِ وَٱلْمُحْصَنَٰتُ مِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ مِن قَبْلِكُمْ ...﴿٥﴾ ﴾، واتە: ئەمڕۆ هەرچی شتی پاكو چاكە بۆتان حەڵاڵ كراوە، وە خواردنی خاوەن كتێبەكان بۆ ئێوە حەڵاڵە، وە خواردنی ئێوەش بۆ وان حەڵاڵە، وە ئافرەتانی پاكی بڕوادارتان بۆ حەڵاڵن، وە ئافرەتانی پاكی خاوەن كتێبەكانیش بۆ ئێوە حەڵاڵن، كەواتە: پیاوی مسوڵمان بۆی هەیە ژن لە خاوەن كتێبەكان (جوولەكەو نەصرانیی یەكان) بێنێ، بەڵام ئافرەتی مسوڵمان بۆی نیە شوو بكات بە پیاوی جوولەكە یان نەصرانیی، كەواتە: ئەگەر گریمان جوولەكەو نەصرانیی، بە بتپەرستیشو هاوبەش بۆ خوادانەریش لەقەڵەم بدرێن، ئەوە ئەو ئایەتەی سوورەتی (المائدة) ئەوانی جیاكردۆتەوە لە باقی بتپەرستو هاوبەش بۆ خوادانەرەكانو، پێویستیش ناكات بڵێین: ئەوەی سوورەتی (المائدة) ئەوەی سوورەتی (البقرة)ی نەسخ كردۆتەوە، بەڵكو دەڵێین: هەندێكی لێ جیاكردۆتەوە، كە ئەوە پێی دەگوترێ: تایبەتكردن (تَخْصيص)، ئەوەی سوورەتی (البقرة) بەگشتی بووە، بەڵام ئەوەی سوورەتی (المائدة) تایبەتییەو دەفەرموێ: ئافرەتانی خاوەن كتێبان {چ جوولەكەو نەصرانیی چ غەیری وانیش} حەڵاڵن بۆ مسوڵمانان، جیا لە ئافرەتانی كافرو بتپەرستو هاوبەشدانەر، شایانی باسیشە لەبارەی پێناسەی خاوەن كتێبەكان (أهل الكتاب)ەوە، كە ئایا تەنیا جوولەكەو نەصرانییەكانن، یان غەیری وانیشن، لەنێوان زانایاندا ڕاجیایی هەیە، بەڵام من پێم وایە مادام خوای زانا بەگشتی باسی خاوەن كتێبانی كردوە، هەركەسێك ئیسپات بوو كە لە ئەسڵدا خاوەنی كتێبی ئاسمانیی بوونە دەیگرێتەوە، هەرچەندە جوولەكەو نەصرانیی پێش هەمووانن، چونكە خوای بەرزو مەزن بەناو ناوی هێناون .

**مەسەلەی دەیەمو كۆتایی:** خوای زاناو شارەزا دەفەرموێ: ﴿ لَعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ ﴾، واتە: بەڵكو (تذكّر) بكەن، جا ئایا (تذكّر) چییە ؟ زانایان دەڵێن: (حَقِيقَةَ التَّذكُّر: الإستدراكُ عَن نُسيانٍ أو غَفلَةٍ لَما اشتَبَه فيهِ القَلْبُ وَاللّهُ رَكَّبَ فينا بالفِطرَة معرفة الأشياء..)، واتە: (تذكّر) بریتیە لەوەی كە

ئینسان شتێکی لەبیرچووبێتەوە، یان لە شتێك بێئاگابووبێو بەبیری بێتەوە، شتێك کە دڵ تێیدا بە سەهو چووبێ، وە خوا هەموو ئەو شتانەی فەرمانی پێکردوونو بەچاکیان دادەنێت، لە فیطرەتی ئێمەدا داینـاون‌و، ئینسان لە ناخیدا هەست بەوە دەکات کە چاکن، بەڵام جاری وا دەبی لێیان بێئاگا دەبێت، یاخود لەبیری دەچنەوەو شەریعەت هاتوە وەبیری بێنێتەوە، خوای بە بەزەیی لەو کەسانەمان بگێڕێ کە هەمیشە ئەو شتە باشانەی شەریعەت فەرمانیان پێدەکات لە یادمان بن‌و لەبیرمان نەچن.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی چل و شەشەمین

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان تەفسیرکردنی دوو ئایەت لە سوورەتی (البقرة)، ئایەتەکانی ژمارە: (٢٢٢و ٢٢٣) دەگرێتە خۆی، کە باسی کەوتنە حەیزی ئافرەتان دەکەن، وە خۆ دوورگرتنی مێرد لە ژنی لەکاتێکدا دەکەوێتە حەیزەوە، پاشان چۆنیەتی چوونە لای مێرد بۆ ژن لەڕووی شەرعییەوە دەبێ چۆن بێت ؟

﴿ وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْمَحِيضِ ۖ قُلْ هُوَ أَذًى فَٱعْتَزِلُوا۟ ٱلنِّسَآءَ فِى ٱلْمَحِيضِ ۖ وَلَا تَقْرَبُوهُنَّ حَتَّىٰ يَطْهُرْنَ ۖ فَإِذَا تَطَهَّرْنَ فَأْتُوهُنَّ مِنْ حَيْثُ أَمَرَكُمُ ٱللَّهُ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلتَّوَّٰبِينَ وَيُحِبُّ ٱلْمُتَطَهِّرِينَ ﴿٢٢٢﴾ نِسَآؤُكُمْ حَرْثٌ لَّكُمْ فَأْتُوا۟ حَرْثَكُمْ أَنَّىٰ شِئْتُمْ ۖ وَقَدِّمُوا۟ لِأَنفُسِكُمْ ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّكُم مُّلَٰقُوهُ ۗ وَبَشِّرِ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٢٢٣﴾ ﴾.

## مانای وشە بە وشەی ئایەتەکان

((وە لەبارەی حەیزەوە پرسیارت لێدەکەن: بڵێ: ئەوە ئازارێکە (واتە: ئازارێکە تووشی ئافرەت دێت) دەجا لەکاتی کەوتنە حەیزدا کەنارگیریی لە ژنان بکەنو توخنیان مەکەون هەتا پاك دەبنەوە، جا هەرکات خۆیان پاککردەوە، لەو شوێنەوە کە خوا فەرمانی پێکردوون بچنە لایان، بەڕاستی خوا ئەوانەی دەگەڕێنەوە لای خۆشی دەوێن، وە ئەوانەی خۆ پاککەرەوەن خۆشی دەوێن ﴿٢٢٢﴾ ژنەکانتان کێڵگەن بۆتان دەجا کەیو چۆنتان ویست، بچنە لای کێڵگەکانتان، وە بۆخۆتان نیەتو کاری باش پێش بخەنو پارێز لە خوا بکەنو بزانن کە ئێوە

پێی دەگـەن، وە مـوژدە بـدە بە بڕواداران (واتـە: بڕوادارانێـك كە پابەنـدبن بە سنوورەكانی خـوای پەروەردگـارەوە) ﴿٢٢٣﴾)).

## شیكردنەوەی هەندێـك لە وشـەكان

(**ٱلْمَحِيضِ**): (المَحِيض: الدَّمُ الخَارِجُ مِنَ الرَّحِمِ عَلَى وَصْفٍ مَخْصُوصٍ فِي وَقْتٍ مَخْصُوص)، (مَحِيضْ) بریتیە لەو خوێنـەی كە لـە منداڵـدانی ئافـرەت دێتـەدەر، بەشێوەیەكی تایبـەت وە لـە كـاتێكی تایبەتـدا، ئنجا هەركـام لـە: (مَحِيض وحَيْض): هەم حەیز دەگرنەوە هەم كاتی كەوتنـە حـەیزیش، ئنجـا ئایا (حَيضْ) لە زمانی عەرەبیـدا لـە چییەوە هاتوە ؟ (حَاضَ يعنـي: فَاضَ) واتە: ڕژا، ئەو خوێنەی كە لە ئـافرەت دەڕژێ (حَاضَت الـمرأَةُ) واتـە: خوێنی لێـڕژا ئافرەتەكە، خوێنی لێهـات.

(**أَذًى**): (الأَذَى: مَايصلُ إِلـى الحَيْوانِ مِنَ الضَّـرَر، وأَذِيَ الشَـيءُ يـأذى أذىً وأذاةً وأَذيـةً: قَـذِرَ، أذى فُـلان: أصـابَهُ أذىً، وأَذِيَ بِكَذا، تَـضرَّر بِـهِ وتـأَلَّم مِنـهُ)، (أَذَى) بریتیە لە هەر زیانێك كە بە ژیانلەبەرێك بگـات، وە لێـرەدا مەبەست ئەوەیە كـە ئـافرەت لـەكاتی كەوتنـە حـەیزدا، جۆرێـك لـە حاڵـەتی نـا تەندروسـتیی و جۆرێك لە حاڵەتی نەخۆشیی هەیە، هەروەها وشەی: (أَذَى) مانـای قێزەونیی (قـذارة)ش دەگـەیەنێ.

(**فَٱعْتَزِلُواْ**): (الإعْـتِزَالُ: تَجَنُّبُ الشَّـيءِ عُمَالَـةً كَانَـتْ أو بَـرَاءَةً أو غَيْرَهُمَـا بالبَـدَنِ كَانَ ذَلِكَ أو بالقَـلْبِ)، (إعتزال) بریتیە لـەوە كـە ئینـسان خـۆی لـە شـتێك دووربگـرێ، بە كردەوە خۆی لـێ دووربگـرێ، یاخـود لـەڕووی فكرییـەوە خـۆی لـێ دووربگـرێ، واتـە بـە بـەدەن یـاخود بـە دڵ، كـە لێـرەدا مەبەسـت ئەوەیـە لـەڕووی بەدەنییـەوە خۆتـانی لـێ دووربگـرن، واتـە: لەگـەڵیان جـووت مـەبن ئەگەرنا مەبەست ئەوە نیە لەگەڵیان نەبـن لە ماڵـێ.

(وَلَا تَقْرَبُوهُنَّ): (كِنَايَةٌ عَنِ الجِمَاعِ)، واتە: نزیکیان مەکەون، کە لێرەدا ئاماژەیە بۆ سەرجێی کردنو جیماع.

(يَطْهُرْنَ): (طَهُرَتِ المَرأَةُ طُهْراً وَطَهَارَةً، وَطَهَرَتْ: خِلافُ طَمَثَتْ: ﴿وَلَا تَقْرَبُوهُنَّ حَتَّىٰ يَطْهُرْنَ فَإِذَا تَطَهَّرْنَ﴾، فدلّ باللفظين عَلَى أنَّهُ لا يَجُوز وطؤهُنَّ إلاّ بَعْدَ الطّهَارَة والتّطْهِير، وقِرَاءَة (يَطهَّرن: أي يَفعَلْنَ الطَهَارَة الَّتي هِيَ الغُسْل)، دەگوترێ: (طَهُرَتِ المَرأَةُ)، واتە: ئافرەتەکە پاکبۆوە، پێچەوانەی (کەوتە حەیزەوە)یە، واتە: کە خوێنی حەیز نەما، دەگوترێ ئەو ئافرەتە پاك بۆتەوە، کەواتە: (يَطْهُرن) پاکبوونەوەیان لە حەیز دەگەیەنێ، وەستانی خوێنی حەیز، وە (تَطهَّرنَ) خۆشۆردنیان دەگەیەنێ.

(حَرْثٌ لَّكُمْ): (الحَرْثُ: إلقاء البذر في الأرض وتَهْيِئَتُها للزَّرع ويُسمَّى المحروثُ حَرْثاً ﴿أَنِ اغْدُوا عَلَىٰ حَرْثِكُمْ إِن كُنتُمْ صَارِمِينَ ﴿٢٢﴾﴾ القلم، ﴿نِسَاؤُكُمْ حَرْثٌ لَّكُمْ فَأْتُوا حَرْثَكُمْ أَنَّىٰ شِئْتُمْ﴾، وَذَلِكَ عَلَى سَبِيلِ التَّشبيه، فبالنِسَاءِ زرعُ ما فيهِ بقاء نَوع الإنسان، كَمَا أنَّ بالأرضِ زرع ما بِهِ بقاء أشخاصهم)، واتە: (حَرْث) بریتییە لە تۆو وەشاندن لە زەویدا، (بۆ وێنە: گەنمو جۆو نیسكو نۆك) وە ئامادەکردنی ئەو کێڵگەو زەوییە بۆ ئەوەی تۆوی تێدا بوەشێنرێت، وە جاری وایە ئەو زەوییە کە تۆوی تێدا دەوەشێنرێت، پێی دەگوترێ (حَرْث)، کە لێرەدا ئافرەتان چوێنراون بە کێڵگەیەك کە تۆوی تێدا دەچێنرێ، چونکە لە ئەنجامی پێکگەیشتنی پیاوو ئافرەتدا منداڵ پەیدادەبێ، {ئاوی پیاو لەگەڵ ئاوی ئافرەت لەنێو منداڵدانی ئافرەت یەکدەگرێ ئنجا منداڵ دروست دەبێت، کە وەك تۆوەشاندن وایە}، دیارە بەهۆی ئافرەتانەوە بەشەر وەچەی بەردەوام دەبێ، وەك چۆن بەهۆی زەوییەوە ئەو کشتوکاڵە دەکرێ کە مایەی بەردەوامبوونی ژیانیانە.

(أَنَّى): (أَنَّى: أداة للبَحث عَنِ الحالِ والمَكان، ولِذَلِكَ قِيلَ: هُوَ بِمعنَى: كَيْفَ وأَيْنَ لتضَمُّنه معناهُما)، واتە: (أَنَّى) بریتییە لە ئامراز بۆ پرسیارکردن دەربارەی حاڵو دەربارەی شوێن، بۆیە هەندێکیان گوتوویانە: (أنّى) بەمانای چۆن (كَيْفَ)و بەمانای لەکوێ (أينَ) دێ، کەواتە: کە دەفەرموێ: ﴿ فَأْتُوا۟ حَرْثَكُمْ أَنَّىٰ شِئْتُمْ ﴾، واتە: چۆن دەتانەوێ لەگەڵ خێزانتاندا جووتبن، یان لە کوێوە دەتانەوێ لەگەڵیان جووتبن، بەڵام گرنگ ئەوەیە لە شوێنی دیاریکراو دابێ، کە شوێنی تۆو وەشاندنو زاووزێیە.

## هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتەکان

١) هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو ئایەتە، کە دەفەرموێ: ﴿ وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْمَحِيضِ ۖ قُلْ هُوَ أَذًى فَٱعْتَزِلُوا۟ ٱلنِّسَآءَ فِى ٱلْمَحِيضِ ﴾، {(عَنْ أنَسٍ أنَّ الْيَهُودَ كَانُوا، إذَا حَاضَتِ المَرْأَةُ فِيهِمْ، لَمْ يُؤَاكِلُوهَا، وَلَمْ يُجَامِعُوهُنَّ فِي الْبُيُوتِ، فَسَأَلَ أَصْحَابُ النَّبِيِّ ﷺ فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى: ﴿ وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْمَحِيضِ ۖ قُلْ هُوَ أَذًى فَٱعْتَزِلُوا۟ ٱلنِّسَآءَ فِى ٱلْمَحِيضِ ﴾ إلَى آخِرِ الآيَةِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: (إصْنَعُوا كُلَّ شَيْءٍ إلاَّ النِّكَاحَ) فَبَلَغَ ذَلِكَ الْيَهُودَ، فَقَالُوا: مَا يُرِيدُ هَذَا الرَّجُلُ أن يَدَعَ مِنْ أمْرِنَا شَيْئاً إلاَّ خَالَفَنَا فِيهِ...) رَوَاهُ مُسلم برقم: (٦٩٢)}، واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك خوا لێی ڕازی بێ دەگێڕێتەوە، دەڵێ: جوولەکەکان عادەتیان وابوو کە ئافرەت دەکەوتە حەیزەوە، نە نانیان لەگەڵ دەخوارد، وە نە لەگەڵیشیدا دەبوون لە ژووریو لەگەڵیدا نەدەخەوتن لە ماڵێ، لەوبارەوە هاوەڵانی بەڕێزی پێغەمبەر خوا لێیان ڕازی بێ پرسیاریان لە پێغەمبەر ﷺ کرد، خوای بەرزیش ئەم ئایەتەی نارده خوار (پێشتر تەفسیرمان کرد) دەفەرموێ، پرسیارت لێدەکەن دەربارەی حەیز بڵێ: (ئەوە ئازارە، لەکاتی حەیزدا مەچنە لای ژنەکانتان)، جا پێغەمبەریش ﷺ پێی فەرموون:

(إِصْنَعُوا كُلَّ شَيءٍ إِلاَّ النِّكَاحَ)، واته: كاتێك خێزانەكانتان دەكەونە حەیزەوە، هەموو شتێكتان بۆ ڕەوایە لەگەڵیان، جگە لە جووتبوون (واته بۆت هەیە نانی لەگەڵ بخۆی، لەگەڵی بخەوی، بۆت هەیە سەر بە ڕانی بكەی... هتد، هەموو ئەو شتانەی ژن و مێرد بەیەكەوە دەیكەن، بۆت هەیە، بەڵام بۆت نیە لەگەڵیدا جووتبیت)، ئنجا كە ئەو هەواڵە بە جوولەكەكان گەیشتەوە جوولەكەكان گوتیان: (ما يُرِيدُ هَذَا الرَّجُلُ أن يَدَعَ مِنْ أمْرِنا شَيئاً إلاَّ خَالَفَنَا فِيهِ...) گوتیان: ئەو پیاوە (واته: پێغەمبەرﷺ) هیچ شتێكی ئێمە لێناگەڕێ، هەر دەیەوێ بە پێچەوانەی ئێمەوە بجووڵێتەوەو هەرشتێكی ئێمە دەیكەین ئەو دەیەوێ پێچەوانەكەی بكات، واته: وایانزانی پێغەمبەر ﷺ لە عەكسی واندا وادەكات، بەڵام ئەوان لەڕاستیدا زێدەڕۆییان كردبوو، هەتا لە تەوراتدا هاتوە دەڵێ[1]: ئافرەتێك كە دەكەوێتە حەیزەوە ئەگەر دەستی لە شتێك دابایە ئەو شتەیان بە پیس دادەنا، وە لە ژووری لەگەڵ ئافرەتەكە نەدەبوون، وە نانیان بەدەستی وی نەدەخواردو زۆر سەخت گیرییان دەكرد، ئیدی ئیسلام ئەو شتانەی هەموو لابرد، وە ڕایگەیاند بەس سەرجێی دروست نیە، چونكە خۆ ئافرەت بە حەیز هیچی لێ نەهاتوە، ئەو ئافرەتە ئەوەندەیە كەوتۆتە حەیزەوەو، لەو حاڵەتەدا وەك نەخۆشیی وایە بۆی، وە لەكاتی حەیزدا پیاو ئەگەر بچێتە لای ئافرەتیش ئافرەتەكە ئازاری پێدەگاتو بۆ پیاوەكەشی ئازارە، وە منداڵیشیان نابێت لەكاتی حەیزدا، كەواتە: بۆ هەموو لایەك زەرەرە، منداڵ پەیدانابێتو ئافرەتیش زیانبار دەبێتو تووشی ئازارو ناڕەحەتیی زیاتر دەبێت، وە پیاوەكەش تووشی زەرەرو زیان دەبێت لەڕووی تەندروستیی یەوە، بۆیە شەرع ئەوەی قەدەغەكردوە، بەڵام شتەكانی دیكە لە جێی خۆیان دان.

---

١) بڕوانە: (التفسير التطبيقي للكتاب المقدس) العهد القديم، سفر اللاّويين، الإصحاح: (١٥)، ص: (٢٤٣)، (نجاسة طَمْث المرأة) كە دەڵێ:

{وإذا حاضت المرأة فَسبعةُ أيام تكون في طَمْثها، وكلُّ مَنْ يَلْمِسُها يكون نَجساً الى المساء، كل ما تنام عليه في أثناء حَيْضها أو تَجليسُ عليه نَجساً، وكل مَن يَلْمِسُ فِراشَها يَغسِلُ ثيابه ويستَحِمُّ بماءٍ ويكون نَجساً الى المساء .... الخ}.

٢) هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو ئایەتە، کە دەفەرمویّ: ﴿ نِسَآؤُكُمْ حَرْثٌ لَّكُمْ فَأْتُواْ حَرْثَكُمْ أَنَّىٰ شِئْتُمْ ﴾، {(عَنْ ابنِ الـمُنْكَدِرِ قَالَ: سَمِعْتُ جَابِراً ﷺ قَالَ: كَانَتِ اليَهُودُ تَقُولُ: إذَا جَامَعَهَا مِنْ وَرَائِهَا جَاءَ الوَلَدُ أحْوَلَ، فَنَزَلَتْ: ﴿ نِسَآؤُكُمْ حَرْثٌ لَّكُمْ فَأْتُواْ حَرْثَكُمْ أَنَّىٰ شِئْتُمْ ﴾) (مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ، البُخَارِيُّ بِرقم: (٤٥٢٨)، وَمُسلم برقم: (٣٥٢١)، وَأَبُو دَاوُدَ بِرقم: (٢١٦٣)}، واتە: ئیبنو لـمونكەدیر (کە یەکێکە لە زانایانی تابعین) دەڵێ: گوێم لە جابری کوڕی عەبدوڵڵا بوو خوا لێی ڕازی بێ دەیگوت: جوولەکەکان دەیانگوت: ئەگەر پیاو لەلای پشتەوە ڕا بچێتە لای خێزانیو منداڵیان ببێ، منداڵەکە خێل دەردەچێ، (لەلای پشتەوە ڕا، واتە هەر لە شوێنی مەبەست لەگەڵی جووتبێ، بەڵام لە لای پشتەوە ڕا بێت)، ئیدی ئەم ئایەتە هاتە خوار کە: نەخێر ئەوە ئەسڵو ئەساسی نیە مادام لە شوێنێکە وەبێ کە شەرع دیاریکردوە {کە لەو شوێنەوەش نەبێت منداڵ پەیدا نابێت}، با لەباری پشتەوەش بێت شتێکی شەرعییە، خوای بە بەزەیی هەموو ئەو شتانەی ڕوونکردۆتەوە بۆ ئەوەی ئەو زێدەڕۆییو ئەفسانەو شتانەی کە بەناوی دینەوە پەیداکراون، لەلایەنی جوولەکەو نەصرانییەکانەوە، بەرپەرچیان بداتەوە، وە ژنو مێردایەتییو ژیانی جینسیی لەنێوان پیاوانو ژناندا، بگەڕێتەوە حاڵەتی ئاساییو سروشتیی خۆیو، لە هەمان کاتیشدا مرۆڤ خۆشی دووربگرێ لەو غەڵەتو لادانانەی کە پەیدابوون، کە دوایی زیاتر تیشکیان دەخەینەسەر.

## مانای گشتی ئایەتەکان

خوای پەروەردگار پێغەمبەری خۆی ﷺ دەدوێنێو لەسەر وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارانە کە ئاڕاستەی کراون، دەفەرموێ: ﴿ وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْمَحِيضِ ﴾، پرسیار لە تۆ دەکەن دەربارەی حەیز، حەیز هەم بەمانای خودی حەیز دێت، هەم بەمانای کاتی کەوتنە حەیزیش دێ، وە هەم بەمانای ئەو شوێنەش دێ کە

خـوێنی حـەیز پێیـدا دێ، ﴿ قُلْ هُوَ أَذًى ﴾، بڵـێ: کەوتنـە حـەیز، ئـازارە {بـۆ ئافرەتەکە ئـازارەو بۆ پیـاوەکەش تووشـی نەخۆشیی دێـن}.

پزیـشکەکان دەڵـێن: ئـەو خوێنـی حـەیزە لەبەر ئـەوەی خوێنێکـی بـاش نیـە، بۆیـە لـە بـەدەنی ئافـرەت دێتـە دەرێو خوێنێکـی ئاسـایی نیـەو نائاسـایی یـە بۆیـە بـەو هۆیـەوە هەرکـام لـە ژنو پیـاو تووشـی ئـازار دەبن، وە منـداڵیش لـەو کاتـەدا پەیـدا نابێـت، ﴿ قُلْ هُوَ أَذًى فَٱعْتَزِلُواْ ٱلنِّسَآءَ فِى ٱلْمَحِيضِ ﴾، بڵـێ: حـەیز ئـازارە لەکـاتی حـەیزدا کەنار بگـرن لـە ژنـان، واتـە: مەچـنە لایـانو لەگەڵیانـدا جووت مەبن ﴿ وَلَا تَقْرَبُوهُنَّ ﴾، تەئکیدی دەکاتەوە: وە تووشیان مەبنو توخنیـان مەکەون، وەك لەگـەڵ جووت بـوون ﴿ حَتَّىٰ يَطْهُرْنَ ﴾، هـەتاکو پـاك دەبنـەوە، واتـە: هەتا لە خوێنی حەیز پاکدەبنەوە ﴿ فَإِذَا تَطَهَّرْنَ ﴾، ئنجا ئەگەر خۆیان پاککردەوە، واتە: خۆیـان شـۆری، ئەوەی پێشـێ کـە فـەرمووی: ﴿ حَتَّىٰ يَطْهُرْنَ ﴾، هـەر ئەوەنـدە دەگەیـەنێ کـە ئافرەتەکـە خـوێنی حـەیزی نـەمێنێ، بـەڵام ئـەوەی دووەمیـان کـە دەفەرموێ: ﴿ فَإِذَا تَطَهَّرْنَ ﴾، وێڕای ئەوەی کە خوێنەکەی دەبڕێ، دەبـێ، خۆیـشی بـشوات، ئنجـا پیـاو بـۆی هەیـە بـچێتـە لای، وە هـەر ئـەو وشـەیەی پێـشێش ئـەم خوێندنەوە (قِـرَاءة)شی هەیـە (حَتَّـى يَطَّـهَّرْنَ)، واتـە: هـەتا خۆیـان پاکدەکەنـەوەو خۆیـان دەشـۆن، کەواتـە: دەبێـت هـەموو لایـەك بـزانین کـە ئـافرەت تـەنیا بەهـۆی ئـەوەوە کە خوێنی حەیزی وەستاوە، بۆ پیاوەکەی حەڵاڵ نیە، بەڵکو دەبێ خۆشـی بـشوات، ئنجـا حـەڵاڵ دەبێـت ﴿ فَإِذَا تَطَهَّرْنَ فَأْتُوهُنَّ مِنْ حَيْثُ أَمَرَكُمُ ٱللَّهُ ﴾، جـا ئەگەر خۆیان شـۆرد، بـچنە لایـان لـەو شـوێنەوە کـە خـوا فـەرمانی کـردوە، خـوای کـاربەجێ لـە کوێـوە فـەرمانی کـردوە؟ بێگومـان لـەو شـوێنەوە کـە منـداڵ پەیـدا دەبێـت. ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلتَّوَّٰبِينَ وَيُحِبُّ ٱلْمُتَطَهِّرِينَ ﴾، بێگومـان خـوا تۆبەکـارانی خۆشـدەوێن، وە خـۆ پاککـەرەوانی خۆشـدەوێن، واتـە: ئەوانـەی خۆشـدەوێن کـە

پەشێمان دەبنەوەو دەگەڕێنەوە بۆ لای خوا، وە ئەوانەشی خۆشدەوێن کە خۆیان پاکدەکەنەوە، چ لەڕووی مەعنەوییەوە چ لەڕووی ماددییەوە، وە هیچ شتێك ناکەن لەڕووی شەرعییەوە بە پیس‌و خراپ دانرابێ، ئنجا دەفەرموێ: ﴿نِسَآؤُكُمۡ حَرۡثٞ لَّكُمۡ﴾، ژنەکانتان کێڵگەن بۆ ئێوە، لێرەدا ئەوە ویچواندن (تشبیە)ی پێ دەڵێن، واتە: وەك کێڵگە وان بۆ ئێوە، لە ئەنجامی ئەوەدا کە پیاو لەگەڵ ئافرەت جووت دەبێت، تۆوی پیاو دەچێتە نێو منداڵدانی ئافرەتەوەو، لەگەڵ تۆوی ئافرەت یەکدەگرن‌و لە ئەنجامی ئەوەدا منداڵ پەیدادەبێت، وەك چۆن هەتا تۆو بە زەوی وەرنەکەی، دەغڵ‌و دان پەیدانابێت، بە هەمان شێوەش ئافرەت‌و پیاو دەبێ پێکەوە جووتبن، ئەوجار وەچەی بەشەر، پەیدادەبێت ﴿فَأۡتُواْ حَرۡثَكُمۡ أَنَّىٰ شِئۡتُمۡ﴾، دەجا بچن بۆ لای کێڵگەکانتان هەر کاتێك ویستتان، یاخود هەرچۆنێك ویستتان، چ لەڕووی کاتەکەیەوە، مادام ئەو ئافرەتە بێنوێژ نەبێت، وە لەڕووی چۆنیەتییەکەیەوە، لە پێشەوە ڕابێ، یان لەباری پشتەوە بێ، یان لەسەر تەنیشت بێت، بەهەر شێوەیەك بێت گرنگ ئەوەیە لە شوێنی تایبەتی خۆیەوە بێت.

﴿وَقَدِّمُواْ لِأَنفُسِكُمۡ﴾، وە بۆخۆشتان پێش بخەن، واتە: نیەتی چاك پێش بخەن، کاتێك ئینسان لەگەڵ هاوسەری جووت دەبێت، نیەتی ئەوەی لێبێنێ خوا ﷻ منداڵی صاڵحیان بداتێ، وە نیەتی ئەوەی لێبێنێ کە خۆی پاك ڕابگرێ لە گوناهان‌و چاوی لە حەرام نەبێت‌و، خێزانەکەی چاوی لە حەرام نەبێت، ئەو نیەتە باشانەی هەبن مانای وایە، مرۆڤ خودی ئەو سەرجێیکردنەشی بۆ دەبێتە طاعەت، وەك لە (صحیح)ی موسلیمدا هاتوە، پێغەمبەر ﷺ ڕۆژێك بە هاوەڵانی فەرموو: {(وَفِي بُضْعِ أَحَدِكُمْ صَدَقَةٌ، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَيَأْتِي أَحَدُنَا شَهْوَتَهُ وَيَكُونُ لَهُ فِيهَا أَجْرٌ ؟! قَالَ: أَرَأَيْتُمْ لَوْ وَضَعَهَا فِي حَرَامٍ أَكَانَ عَلَيْهِ فِيهَا وِزْرٌ، فَكَذَلِكَ إِذَا وَضَعَهَا فِي الْحَلَالِ كَانَ لَهُ أَجْرٌ) (رَوَاهُ مُسلم برقم: (٢٣٢٦)، عَنْ أَبِي ذَرٍ}، واتە: یەکێك لە ئێوە دەچێتە لای خێزانی پاداشتی هەیە، گوتیان: واتە: ئەی پێغەمبەر ﷺ یەکێك لە ئێمە ئارەزووی خۆی جێبەجێ دەکات،

چۆن پاداشتی هەیە؟! فەرمووی: ئەگەر ئەو ئارەزووەی لە حەرامدا جێبەجێ بکات گوناهی ناگات؟ {گوتیان: با}[1]، فەرمووی: دەجا ئەگەر لە حەلاڵیشدا جێبەجێی بکات پاداشتی هەیە، ﴿ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَٱعْلَمُوٓاْ أَنَّكُم مُّلَٰقُوهُ ﴾، وە پارێز لە خوا بکەنو بزانن کە ئێوە بە خوا دەگەن، واتە: بزانن بە چ چاوڕوویێك دەچنەوە لای خوا، شتی حەرام مەکەن، شتی پیس مەکەن، ﴿ وَبَشِّرِ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴾، وە موژدە بدە بە ئیمانداران، واتە: ئەو ئیماندارانەی کە پابەند دەبن بە سنوورەکانی خواو یاساکانی خواوە موژدەیان پێبدە، کە خوای بە بەزەیی لە دوارۆژدا ژیانێکی خۆشترو چاکتریان بەنسیب دەکات.

## چەند مەسەلەیەکی گرنگ

**مەسەلەی یەکەم:** دەربارەی ئەو ڕستەیە کە دەفەرموێ: ﴿ وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْمَحِيضِ ۖ قُلْ هُوَ أَذًى فَٱعْتَزِلُواْ ٱلنِّسَآءَ فِى ٱلْمَحِيضِ ﴾، پرسیارت لێدەکەن دەربارەی حەیز، بڵێ: ئەوە ئازارە، لەکاتی حەیزدا لە ژنەکانتان دووربکەونەوە، واتە سەرجێییان مەکەن، لەڕووی عیلمییەوە هۆیەکەی ئەوەیە کە ئەو هێلکۆڵەی لەنێو ئاوی ئافرەت دایە لە کاتی حەیزدا موتوربە نابێتو یەك ناگرێت لەگەڵ ئەو زیندەوەر (حیمن)ەی کە لەنێو ئاوی پیاو دایە، چونکە هەر دڵۆپێك لە تۆوی پیاو، بە هەزاران زیندەوەری گچکەی تێدایە، کە بە عەرەبیی پێیان دەڵێن: (حیامن) کە کورتەی: (الحیوانات المنویة)، زیندەوەری نێو ئاوی پیاو، تاکەکەی پێی دەڵێن: (حیمن) واتە: زیندەوەری تۆویی، تۆویلکە، منداڵ لە چی پەیدادەبێت؟ ئێمە هەمووومان چۆن پەیدابوویین؟ یەکێك لەو زیندەوەرە گچکانەی کە لەنێو ئاوی پیاودا هەیە، کە بە هەزاران لە هەر دڵۆپەیەکیدا هەیە، یەکێك لەو

---

١) خۆم زیادم کرد، چونکە سیاقی فەرموودەکە، دەیخوازێو دەیگەیەنێ.

زیندەوەرانە گچکانە لەگەڵ زیندەوەرێکی گچکەدا کە لەنێو ئاوی ئافرەتدا هەیەو تەنیا یەك دانەیەو پێی دەگوترێ: هێلکۆڵە (بويضة) یەکدەگرێو، بە هەردووکیان (نُطفَة) پێکدێنن، واتە: زیندەوەرێکی دیکە پێکدێنن پێی دەگوترێ: (نُطفَة)، ئنجا ئەو (نُطفَة)یە کە بە چاو نابینرێ بە زەڕەبین دەبینرێو لەنێو منداڵدانی ئافرەتدا گەورە دەبێتو گەشە دەکات، تا دوایی دەبێتە زەرووله (عَلَقَة)، ئنجا دەبێتە (مُضْغَة)، دوایی ئێسقان (عظام) لێ پەیدادەبێتو بە گۆشت دادەپۆشرێ، دوایی خوای زاناو توانا ڕووحی بەبەردا دەکات، ئاوا منداڵ دروست دەبێت، جا حەیز هۆکارەکەی ئەوەیە، چونکە ئافرەت کە دووگیان (حامل) بووو منداڵی لە منداڵداندا پەیدابوو، خوێنی حەیزی نامینێو، هەبوونی خوێنی حەیز بەڵگەی ئەوەیە، کە ئەو ئافرەتە جارێ دووگیان نەبووە، واتە: ئەو زیندەوەرەی نێو ئاوی پیاو لەگەڵ ئەو هێلکۆڵەی نێو ئاوی ئافرەت، یەکیان نەگرتوەو نوتفەیان پێك نەهێناوە.

ئنجا ئایا ماوەی حەیز چەندە ؟

جاری وا هەیە کاتی حەیز، یەك جارە لە ماوەی سەعاتێکدا، یاخود کەمتریشە، وە جاری وا هەیە، ماوەی شەوو ڕۆژێکە، وە جاری وا هەیە سێ شەوو سێ ڕۆژەو، جاری وا هەیە دە شەوو ڕۆژە، وە جاری واش هەیە پازدە شەوو ڕۆژیش دەوام دەکات، وە لەکاتی حەیزدا ئافرەت نوێژی لێ قەدەغە دەبێتو ڕۆژووگرتنی لێ قەدەغە دەبێت، بەڵام دوایی ڕۆژووەکانی دەگرێتەوە، بەس نوێژەکانی ناگێڕێتەوە، وەك لەم دەقەی سوننەت دا هاتوە: {عن معاذة: أن امرأةً سَألَتْ عائشة فقالت: أتَقضي إحانا الصّلاة أيّام مَحِيضِها ؟ فقالت عائشة: أَحرورِيةٌ[1] أنتِ ؟ قد كانت إحدانا تحيضَ على عهد رسول الله ، ثم لا تُؤْمَرُ بِقَضاءٍ}، البخاري: (٣٢١)، و مسلم: (٣٣٥).

ئەمەش ریوایەتێکی دیکەیە:

١) حروريٌ: یانی : خارجيٌ، یەکێك لە (خوارج)

{عن معاذة قالت: سألتُ عائشة فَقُلْتُ: ما بالُ الحائض تَقْضي الصومَ ولاتقضي الصلاة؟ فقالت: أحرورية أنتِ؟ قلت: لَسْتُ بحرورية، لكنّي أسألُ، قالت: كان يُصيبُنا ذلك فَنُؤْمَرُ بقضاء الصَّوم ولا تؤمَرُ بقضاء الصلاة}.

واتە: پرسیار لە دایکمان عائیشە کراوە خوا لێی ڕازی بێت: بۆچی ئافرەت ڕۆژوو دەگێڕێتەوە کە بەهۆی حەیزەوە فەوتابن، یان بەهۆی زەیستانییەوە، بەڵام نوێژان ناگێڕێتەوە؟! فەرموویەتی: ئێمە لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ فەرمانمان پێکرا ڕۆژووان بگێڕینەوە، بەڵام فەرمانمان پێ نەکرا نوێژەکان بگێڕینەوە، ئەوەش حیکمەتەکەی، یان حیکمەتێکی ئەوەیە، کە گێڕانەوەی ئەو هەموو نوێژانە سەغڵەتیی زۆری تێدایە، بەڵام ڕۆژووەکان لەبەرئەوەی مانگی ڕەمەزان یەك مانگە لە دوازدە مانگانو عیبادەتێکی گەورەشە، وە گێڕانەوەشیان هێندە قورس نیە.

**مەسەلەی دووەم:** دەربارەی: ﴿ فَٱعۡتَزِلُواْ ٱلنِّسَآءَ فِي ٱلۡمَحِيضِ وَلَا تَقۡرَبُوهُنَّ ﴾، پێشتریش باسمان کرد، کە لێرەدا مەبەستی کەنارگیرییە لەسەر جێیو جووتبوون، نەك خۆ دوورگرتن لەوەی کە لە ژوورێ بێتو لەگەڵی لەسەرجێ بخەوێو دەستی وە دەستی بکەوێ !! وەك کاتی خۆی خاوەن کتێبەکان زێدەڕۆییان لەوەدا کردوە، ئنجا ئایا بەڵگەمان چییە؟ بەڵگەمان ئەوەیە کە خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تَقۡرَبُوهُنَّ حَتَّىٰ يَطۡهُرۡنَ ﴾، وە هەتا پاکدەبنەوە، هەتا ئەو خوێنەیان لێنەبڕێ، لێیان نزیك مەبنەوە، واتە: لەو شوێنە نزیك مەبنەوە کە ئەو خوێنەی پێدادێ، نەك دەستی بەدەستی نەکەوێو...هتد، پێغەمبەریش ﷺ کە دەفەرموێ: {(إصْنَعُوا كُلَّ شَيءٍ إلاَّ النِّكَاحَ)، (رَوَاهُ مُسلم برقم: (٦٩٢)}، واتە: تەنیا لەگەڵیان جووت مەبن، ئەگەرنا بۆت هەیە ماچی بکەیو لە باوەشی بگری پێکەوە بخەون.

وە لەوبارەوەش ئەم فەرموودەیە هەیە کە (الطبري) لە تەفسیرەکەی خۆیدا

هێناویەتی[١]، وە ئەم قسەیە ئی عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس و موجاهیدو عیکرەمەو حەسەنی بەصرییشە: {(روی أبو جعفر بن جرير أنَّ مَسرُوقاً رَكِبَ إلى عَائِشَةَ فَقَالَ: السَّلام عَلَى النَّبيِّ وَعَلَى أهلِهِ، فَقَالَتْ عَائِشَةُ: أبو عَائِشَةَ ! مَرْحَباً مَرْحَباً فأذنوا لهُ فَدَخَلَ، فَقَالَ: إني أُرِيدُ أنْ أسألكِ عَنْ شَيءٍ وأنا أَستَحي، فَقَالَتْ: إنَّمَا أنا أمُّكَ وَأنْتَ ابني فَقَالَ: مَا لِلْرَجُلِ مِن امرأتِهِ وَهِيَ حَائِض ؟ فَقَالَتْ: لَهُ كُلُّ شَيءٍ إلاَّ فَرْجَهَا)}، واتە: ئەبو جەعفەری تەبەریی لە مەسرووقەوە دەگێڕێتەوە (کە مەسرووق یەکێکە لە زانایانی تابعین، واتە: جیلی دوای هاوەڵانی بەڕێزی پێغەمبەر ﷺ) دەڵێ: مەسرووق سواری وڵاخ دەبێت و دەچێ بۆ لای دایکمان عائیشە خوا لێی ڕازی بێ خێزانی بەڕێزی پێغەمبەر ﷺ دەڵێ: سەلام لەسەر پێغەمبەر بێ ﷺ وە لەسەر ئەهلی بێ (دیارە لە پشت پەردەوە)، عائیشەش خوا لێی ڕازی بێت دەفەرموێ: تۆ بابی عائیشەی؟ (مەسرووق- یش دیارە کچێکی هەبووە بە ناوی عائیشە) فەرموو، فەرموو... وەرە ژوورێ، ئیزنی دەدەن و دەچێتە ژوورەکەی، ئەویش دەڵێ: من دەمەوێ پرسیار لە شتێك بکەم بەڵام شەرمێ دەکەم، عائیشەش خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ: من دایکتم و تۆش کوڕی منی، چیت هەیە بپرسە، { ئنجا بۆچی عائیشە خوا لێی ڕازی بێ، دایکی مەسرووقە؟ چونکە خوای بەرز دەفەرموێ:

﴿ ٱلنَّبِيُّ أَوْلَىٰ بِٱلْمُؤْمِنِينَ مِنْ أَنفُسِهِمْ وَأَزْوَٰجُهُۥٓ أُمَّهَٰتُهُمْ ... ﴿٦﴾ ﴾ الأحزاب، واتە: پێغەمبەر ﷺ بۆ ئیمانداران لە نەفسی خۆیان لە پێشترە، وە خێزانەکانیشی دایکیانن، وە هەموو خێزانەکانی پێغەمبەر ﷺ بە دایکی ئیمانداران لەقەڵەم دەدرێن، وە کە دەڵێ: لە شەرعدا شەرم نیە، یانی: لە فێربوونی شەرعدا شەرم نیە، نەك بڵێی شەریعەت شەرمی تێدانیە، شەریعەت زۆر فەرمان دەکات کە شەرم بکەی لە شوێنی خۆیدا، بەڵام بۆ شارەزابوون لە شەرع نابێ شەرمێ بکەی} پرسیارەکەی لێدەکات دەڵێ: پیاو ئەگەر ژنی دەکەوێتە حەیزەوە، چی بۆ هەیە، چی بۆ حەڵاڵە؟ (یانی چۆن مامەڵەی لەگەڵدا بکات؟)، گوتی: هەموو

١) بڕوانە: (جامع البيان) للطبري، ج: (٤)، ص: (٣٧٨).

شتێکی بۆ هەیە جگە لە داوێنی، { واتە: جگە لەوەی کە لەگەڵی جووتبێت ئەوەی بۆ نیە، ئەگەرنا بۆی هەیە ماچی بکاتو لە باوەشی بگرێو پێکەوە بخەونو ئەوانە}.

**مەسەلەی سێیەم:** کە دەفەرموێ: ﴿وَلَا تَقْرَبُوهُنَّ حَتَّىٰ يَطْهُرْنَ فَإِذَا تَطَهَّرْنَ فَأْتُوهُنَّ مِنْ حَيْثُ أَمَرَكُمُ اللَّهُ﴾، پێشتریش باسمان کرد، بەلام من هەندێك شت زۆر دووبارە دەکەمەوە بۆ ئەوەی زیاتر لە مێشکتاندا بچەسپێ دەفەرموێ: توخنیان مەکەون هەتا پاکدەبنەوە جا هەرکات خۆیان پاککردەوە، لەو شوێنەوە کە خوا فەرمانی پێکردوە بچنە لایان.

ئەمە لێی وەردەگیرێ کە ژنی حەیزدار:

**یەکەم:** دەبێ خوێنەکەی بێ‌و ببڕێو حەیزی نەمێنێ.

**دووەم:** دەبێ خۆی بشۆرێو پاك بکاتەوە، ئەوجار دروستە کە مێرد بچێتە لای، ئەگەر نا دروست نیە، هەڵبەتە هەندێ لە زانایان گوتوویانە: هەر کە خوێنی حەیزی بڕا، با خۆیشی نەشۆردبێ، بۆ مێردەکەی حەلالە، بەلام زۆربەی هەرە زۆری زانایان دەڵێن: وانیە بەڵکو (إبن كثير) دەڵێ: هەموو زانایان ڕایان وایە حەتمەن دەبێ خۆی بشوات، وە بە حەقیقەتیش ئەگەر تەماشای ڕواڵەتی ئایەتەکەش بکەین، هەر ئەوە دەگەیەنێ، چونکە دەفەرموێ: ﴿وَلَا تَقْرَبُوهُنَّ حَتَّىٰ يَطْهُرْنَ فَإِذَا تَطَهَّرْنَ﴾، توخنیان مەکەون تا پاکدەبنەوە، جا ئەگەر خۆیان پاککردەوە، کەواتە: دەبێ خۆیان بشۆن، (إبن كثير) لەوبارەوە دەڵێ[1]: {(وَقَد اتَّفَقَ العُلَمَاء عَلَى أنَّ المَرْأةَ إذَا انْقَطَعَ حَيضُهَا لا تَحِلُّ حَتَّى تَغْتَسِل بالماءِ أو تَتَيمَّمَ إنْ تعذَّر عَلَيْهَا ذَلِكَ بشَرطِهِ)}، واتە: زانایان لەسەر ئەوە یەکدەنگن کە هەرکاتێك حەیز بڕا (خوێنی حەیز بڕا) ئافرەت حەلال نابێ بۆ مێردەکەی تاکو

---

١) (المصباح المنير في تهذيب تفسير ابن كثير)، ص: (١٦٢).

بە ئاو خۆی نەشوات، یاخود ئەگەر لەبەر هەر هۆیەك بێ نەتوانێ ئاو بەکاربێنێ، تا تەیەمموم نەکات، ئەوەش دیارە بەمەرجی خۆی، (واتە: دەبێ مەرجەکانی ڕەوابوونی تەیەمموم هەبن ئەوجار دروستە).

**مەسەلەی چوارەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ فَأْتُوهُنَّ مِنْ حَيْثُ أَمَرَكُمُ اللَّهُ ﴾، بچنە لایان لەو شوێنەوە کە خوا فەرمانی پێکردوە، (إبن کثیر) لە (إبن أبي حاتم)ەوە هێناویەتی کە (ابن عباس و مجاهد)و جگە لەوانیش خوا لێیان ڕازی بێ، گوتوویانە: ﴿ فَأْتُوهُنَّ مِنْ حَيْثُ أَمَرَكُمُ اللَّهُ ﴾، (يَعنی: الفَرج)، لەو شوێنەوە بچنە لایان کە خوا فەرمانی پێکردوە، واتە: لەلای پێشیەوە، لە داوێنییەوە، پاشان (ابن عباس) گوتوویەتی: {(وَفيهِ دلالَةٌ عَلَى تَحريمِ الوَطأ في الدُّبُر)}[1]، واتە: وە ئەو فەرمایشتەی خوا ئەوە دەگەیەنێ کە: لە پشتەوە (کۆم) یەوە حەرامە پیاو لەگەڵ خێزانەکەی خۆیدا جووتبێت.

**مەسەلەی پێنجەم:** ﴿ نِسَآؤُكُمْ حَرْثٌ لَّكُمْ فَأْتُوا۟ حَرْثَكُمْ أَنَّىٰ شِئْتُمْ ﴾، پێشتریش باسمان کرد کە ئەوە بەهۆی قسەی جوولەکەکانەوە هاتە خوارێ، دەفەرموێ: خێزانەکانتان کێڵگەن بۆ ئێوە، هەر جۆرێکی یان هەرکاتێکی ویستتان، بچنە لای کێڵگەکانتان، چونکە جوولەکەکان دەیانگوت: ئەگەر لەلای پشتەوەڕا پیاو بچێتە لای خێزانیو منداڵیان ببێ منداڵەکە خێل دەردەچێ، بۆیە خوای پاكو تاك فەرمووی: نەخێر لە پێشیەوە دەچێ، یان لە پشتیەوە ڕا، گرنگ ئەوەیە لە شوێنی دیاریکراودا بێ، وە ئەوە ڕاست نیەو منداڵ بەهۆی ئەوەوە خێل دەرناچێ، لەوبارەوەش کە دروستە بەشێوەی جۆراوجۆر مێرد لەگەڵ ژنی دا جووتبێ، دروستە: کۆمەڵێك فەرموودە هەن، بۆ وێنە: {(عَنْ إبنِ عَبَّاسٍ قَالَ: أنزلَت هَذهِ الآية: ﴿ نِسَآؤُكُمْ حَرْثٌ لَّكُمْ ﴾، في أُناسٍ مِنَ الأنصَارِ

---

١) هەمان سەرچاوە، ص: (١٦٢).

أتـوا النّبـيَّ ﷺ فسـألوهُ فقـالَ النّبـيّ ﷺ ائْتِهَا عَلَى كُلِّ حَالٍ إِذَا كَانَ فِي الْفَـرْجِ) (رَوَاهُ أَحْمَـد بـرقم: (٢٤١٤)، وَقَـالَ: شـعيب الأرنـاؤوط: حَسَنٌ لِغَيْـرِهِ) وَقَـالَ: (مُقبِـلة ومـدبرَة إِذَا كَانَ ذَلِكَ فـي الفَـرج) (رَوَاهُ ابْنُ أَبِي حَاتِمٍ بـرقم: (٢١٣٣)}، واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس دەڵێ: ئەم ئایەتە دەربارەی هەندێك لـە پیـاوانی پـشتیوانەکان (الأنـصار) {خـەڵکی مەدینـە} هاتـە خـوار، کـە دەفـەرموێ: ﴿ نِسَآؤُكُمْ حَرْثٌ لَّكُمْ ﴾، چـوونە لای پێغەمبـەر ﷺ لـەوبارەوە پرسیاریان لێکـرد، ئـەویش فـەرمووی: هـەر شـێوەیەك بچـۆ بـۆ لای خێزانـت، گرنگ ئەوەیە لە شوێنی منداڵ بوونـەوە بێت، {لـە داوێنـی یـەوە بێـت}، ئەمـە ڕیوایەتی ئیمام ئەحمـەدە، وە لـە ڕیوایـەتی: (ابـن أبـي حـاتم)دا فـەرمووی: لـە پێشـەوە ڕا دەچی، یان لە پشـتەوە ڕا، گرنگ ئەوەیە لە داوێنی یەوە بێت، {لەو شوێنەی منداڵی پەیدادەبێ}، ئنجا زانایان لەوبـارەوە زۆریـان قـسەکردوە، کـە بە هیچ شێوەیەك پیاو بۆی نیە لـە پاشیەوە، واتـە: لـە کۆمیـەوە بچێ بـۆ لای ژنەکـەی، هەڵبەتـە ئـەوە زۆربـەی زانایـان لەسـەری یـەك دەنگـن، وە چـەند حەدیـسێکیش بـە بەڵـگە دێننـەوە جگـە لـە ئایەتەکـە، کـە خۆیـشی ئـەوە دەگەیەنێ، چونکە دەفەرموێ: لەو شوێنەوە کـە خوا فـەرمانی پێکردوە بچنـە لای کێڵگـەکـانتـان، ئاشکراشـە بـە کوێ دا منـداڵ دەبێ و چۆن منـداڵ دەبێ! یەکێ لەو فەرموودانە: {(عَنْ خُزَيْمَةَ بنِ ثَابت قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ إِنَّ اللهَ لاَ يَسْتَحِيي مِنَ الحَقِّ، ثَلاثَ مَرَّاتٍ، لاَ تَأْتُوا النِّسَاء في أدبارِهِنَّ) (رَوَاهُ ابْنُ مَاجَهْ بـرقم: (١٩٢٤)، وَصَحَّحَهُ الألبـانـي فـي (إرواء الغلـيل) بـرقم: (٢٠٠٥)، و فـي (المشكاة) بـرقم: (٣١٩٢)}، واتـە: (خُزَيْمَـة بـنِ ثَابت الحَضْرمي)، دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا ﷺ سـێ جـاران فەرمـووی: بێگومـان خـوا لـە هـەق گوتنـێ شەرمـی ناکات، خوا لە هەق شەرمێ ناکات، خوا لە هەق گوتنـێ شـەرمێ ناکـات، لـە لای کۆمیانـەوە مەچـنە لای ئافرەتـان (واتـە: لـەو شـوێنەی کـە منـداڵی لـێ پەیدادەبێ لەوێوە لەگەڵ خێزانەکانتان جووتبن).

هەر لەوبارەوە ئەم فەرموودەیەش هەیە: {(عَنِ إبنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: لايَنْظُرُ اللهُ إلى رَجُلٍ أتَى رَجُلاً أو امْرَأةً في الدُّبُرِ) (رَوَاهُ التِّرمِذِيُّ برقم: (١١٦٥)، وقَالَ: هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيب، وَصَحَّحَهُ كُلٌّ مِن ابْنُ حِبَّان وَابْنُ حَزْم، وَحَسَّنَهُ الألباني في (المشكاة) برقم: (٣١٩٥)}، واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس خوا لە خۆیو بابی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: خوا تەماشای پیاوێك ناکات کە دەچێتە لای پیاوێك، یان ئافرەتێك لە کۆمیەوە.

<u>**مەسەلەی شەشەم:**</u> کە دەفەرموێ: ﴿ وَقَدِّمُواْ لِأَنفُسِكُمۡ ﴾، واتە: بۆ نەفسی خۆتان پێشخەن، مەبەست پێی چییە ؟ ئەم فەرمایشتە بەشێکی لێ تەفسیر دەکاتو تارادەیەك وەڵامی ئەو پرسیارە دەداتەوە: {(عَنْ إبنِ عَبَّاس قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: لَوْ أنَّ أحَدَكُم إذَا أرَادَ أن يأتي أهْلَهُ قَالَ: بِسْمِ الله، اللّهُمَّ جَنِّبْنَا الشَّيطَانَ وَجَنِّبِ الشَّيطَانَ مارَزَقْتَنا، فإنَّهُ إنْ يُقَدَّرْ بَيْنَهُمَا وَلَدٌ في ذَلِكَ، لَمْ يَضُرُّهُ الشَّيْطَانَ أبَدَاً) (رَوَاهُ البُخَارِيُّ برقم: (٦٣٨٨)}، واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس خوا لە خۆیو بابی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەگەر یەکێك لە ئێوە کە ویستی بچێتە لای خێزانی (لەگەڵی جووت بێت) لە کاتی جووتبوونی دا بڵێ: بە ناوی خوا، ئەی خوایە شەیتانمان لێ دوور بگرە، وە شەیتان لەوە دوور بگرە، کە پێمان دەبەخشی، ئەوە ئەگەر منداڵیان ببێ بەهۆی ئەو جووتبوونەوە، هەرگیز شەیتان ناتوانێ زیانی لێبدا.

بۆیە لە کوردەواریی خۆماندا ئەگەر کەسێك منداڵێکی ناصاڵح ببینێ، دەڵێ: ئەوە (بِسْمِ الله)ی لێ نەکراوە!

کەواتە: کە دەفەرموێ: ﴿ وَقَدِّمُواْ لِأَنفُسِكُمۡ ﴾، یانی: کاتێ کە دەتانەوێ لەگەڵ هاوسەرتاندا جووتبن، با پێشەکییەك هەبێ، پێشەکییەکە یانی: چی؟ یانی: نیەتی طاعەتی لێبینێ، کە ئەوە هەقی ژنەکەی جێبەجێ دەکات، وە

نیەتی خۆ پاکڕاگرتنو چاو لە حەرام نەبوونی لێبێنێ، وە نیەتی ئەوەی لێبێنێ کە خوای پەروەردگار منداڵەکەیان صالح بکات، وە جووتبوونەکە تەنیا لەڕووی ئارەزوویەکی جەستەییەوە نەبێت، بەڵکو با حاڵەتێکی ئیمانییو طاعەتو خوا بە مەبەست بوونی تێکەڵ ببێ، کە ئەو کاتە وێڕای ئەوە هەقی جەستەی جێبەجێ کردوە، هەقی ڕووحیشی جێبەجێ دەکات، وە پاداشتی دوارۆژیشی دەبێت، هەندێ لە توێژەرەوانیش ڕستەی: ﴿وَقَدِّمُواْ لِأَنفُسِكُمۡ﴾یان بەوە لێکداوەتەوە کە مێرد بۆ جوتبوونی لەگەڵ ژنەکەیدا، دەبێ یەکسەرو بێ پێشەکییو زەمینەسازیی نەبێ، وەك ماچ کردنو دەستبازییو ...هتد، بەڵام دەگونجێ بڵێین: چەمكو واتای ڕستەکە گشتگیرو فراوانەو هەموو واتایەکان دەگرێتەوە.

خوای پەروەردگار لەو کەسانەمان بگێڕێ، کە لە هەموو ڕوویەکەوە، وە لە هەموو لایەنەکەوە، پابەند دەبن بە سنوورەکانی شەریعەتو، بە یاساو ئەدەبو حوکمەکانی شەریعەتەوە... ئامین.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی چل و حەوتەمین

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان تەفسیری دوو ئایەت لە سوورەتی (البقرة)، هەردوو ئایەتی ژمارە: (٢٢٤و ٢٢٥) دەگرێتە خۆی، ئەو دوو ئایەتە باسی سوێند خواردن دەکەن، کە چ سوێندێك پێویستە کەفارەتی بۆ بدرێ‌و چ سوێندێك پێویست بە کەفارەت ناکات کە پێی دەگوترێ: سوێندی: (لَغْـو) کە دوایی چەمك‌و واتایەکەی ڕووندەکەینەوە.

﴿ وَلَا تَجْعَلُوا اللَّهَ عُرْضَةً لِأَيْمَانِكُمْ أَنْ تَبَرُّوا وَتَتَّقُوا وَتُصْلِحُوا بَيْنَ النَّاسِ وَاللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿٢٢٤﴾ لَا يُؤَاخِذُكُمُ اللَّهُ بِاللَّغْوِ فِي أَيْمَانِكُمْ وَلَكِنْ يُؤَاخِذُكُمْ بِمَا كَسَبَتْ قُلُوبُكُمْ وَاللَّهُ غَفُورٌ حَلِيمٌ ﴿٢٢٥﴾ ﴾.

## مانای وشە بە وشەی ئایەتەکان

((- خوا دەفەرموێ: - وە بەهۆی سوێند پێ خواردنەکانتانەوە، خوا مەکەنە ڕێگر کە چاکە بکەن‌و پارێز بکەن‌و ئاشتەوایی لەنێوان خەڵکیدا بکەن، وە خوا بیسەری زانایە ﴿٢٢٤﴾ خوا سوێندی سەرزارەکییتان لێناگرێ، بەڵام ئەوەی بە دڵتاندا دێت، لێتان دەگرێ، وە خوا لێبوردەی هێدییە ﴿٢٢٥﴾)).

## شیکردنەوەی هەندێك لە وشەكان

(عُرۡضَةً ): بە دوو مانا دێ، یان بە مانای پەرچ دێ، پەرچو رێگر، یان بەمانای شتێك كە زۆر بەكارهێنرابێ‌و بێنموودو بێ وەج كرابێ، چونكە وشەی (عُرْضَة) لە (عَرْض)ەوە هاتوە، (العَرْضُ: خِلافُ الطُّول، وعَرضتُ العود على الإناءِ واعترَضَ الشَّيء في حَلْقِهِ: وقفَ فيهِ بالعرْض، والعُرْضَة: مَا يُجْعَلُ معَرَّضاً لِلشَّيء)، (عَرْض) یان (عُرْض) پێچەوانەی پانییە، كە دەڵێی: (عَرَضْتُ العُودَ عَلَى الإناءِ)، واتە: دارەكەم بەسەر قاپەكە ڕاهێشت، وە (اعترض الشيء في حَلْقِهِ) شتێكی لە گەرووداما یەوە، واتە: لە باری پانییدا ئەو شتە وەستاوە.

(لِّأَيۡمَٰنِكُمۡ ): (أَيْمان) لە قورئاندا زۆر بەكارهاتوە، (أَيْمان: جَمْعُ يَمِين، واليَمِينُ في الحَلْفِ مُسْتَعَارٌ مِنَ اليَمين اعتباراً بِمَا يَفعَلُهُ المَعاهِدُ...) وشەی: (أَيْمان) كۆی (يَمين)ە، لێرەدا بە مانای سوێندە، بەڵام لە ئەسڵی زماندا بەدەستی ڕاست دێت، ئنجا ئایا بۆچی سوێند بە (أَيْمان) كۆدەكرێتەوە، هەروەها دەستی ڕاستیش، كە ئەویش دیسان هەر بە (أَيْمان) كۆدەكرێتەوە، بۆچی سوێند پێی دەگوترێ: (يَمين)؟ چونكە كەسێك كە پەیمان لە كەسێك وەردەگرێ، بەدەستی ڕاست پەیمانی لێ وەردەگرێ‌و بەیعەتی لەگەڵ دەكات، (يَمين)یش كە بۆ سوێند بەكارهاتوە، خوازراوەتەوە لە دەست، واتە: لە دەستی ڕاست، بەو ئیعتبارەی كە بە دەستی ڕاست پەیمان دەدرێ‌و سوێند خواردنیش جۆرێكە لە پەیمان دان.

(لَّا يُؤَاخِذُكُمُ ): (الأَخذ: حَوْزُ الشَّيء و تَحْصِيلهِ بالتَّنَاولِ أو القَهْرِ، والمؤاخَذة: المُجَازَاة)، واتە: (أَخذ) لە زمانی عەرەبیدا واتە: وەدەستهێنانی شتێك‌و دەست بەسەرداگرتنی شتێك، (المُؤاخَذة) لە زمانی عەرەبیدا واتە: (المجازاةُ) واتە: سزادانەوە.

(**بِاللَّغْوِ**): (اللّغو مِنَ الكَلام: مَا لا يُعتَدُّ بِهِ وهُوَ الَّذي يُورَدُ لاعن رويّة وفكرٍ فَيجري مَجرى اللغا، وهُوَ صَوت العَصَافير ونُحوها مِنَ الطيور)، واتە: (اللّغو) (کە جاری وایە بۆ کردەوەش بەکاردێت) بەڵام ئەگەر بۆ قسە بەکاربێت قسەیەکە کە گرنگی پێنەدرێ، ئەویش ئەو قسەیە کە دوای بیرکردنەوەو تێوەڕامان نەگوترێ، واتە: بە سەرزارەکیی کابرا قسەکە بکات، قسەیەك کە بە سەرزارەکیی دەکرێ، بەبێ بیرلێکردنەوە، وەك (لَغَا) وایە، (لَغا)ش: بریتیە لە دەنگی چۆلەکە پاساریی و وێنەی چۆلەکە پاساریی کە دەچریوێنێ و بۆ ئێمە هیچ واتایەکی نیە، دیارە بە تەئکید بۆخۆیان واتاو مەبەستێکی هەیە، بەڵام بۆ ئێمە جریوە جریوە، واتە هیچ واتایەکی نیە، قسەیەکیش کە بەبێ بیرلێکردنەوە بکرێ و هەروا بە سەرزارەکیی بگوترێ وەك دەنگی چۆلەکەو باڵندە وایە.

## هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتەکان

هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو ئایەتە، کە دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تَجْعَلُوا۟ ٱللَّهَ عُرْضَةً لِّأَيْمَـٰنِكُمْ أَن تَبَرُّوا۟ وَتَتَّقُوا۟ وَتُصْلِحُوا۟ بَيْنَ ٱلنَّاسِ ۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴾، وەك نەیسابووریی لە (أسباب النزول)ەکەی خۆیدا هێناویەتی کە هۆی هاتنە خوارەوەکەی ئەم بەسەرهاتە بوو: {(قَالَ الكَلْبِي نَزَلَتْ في عَبدالله بن رَوَاحَة رضي الله عنه يَنهَاهُ عَن قَطِيعَة خَتنَهِ بشر بن نعمَان وَذَلِكَ أن ابن رَوَاحَة حَلفَ أن لايَدخلُ عَلَيهِ أبَداً وَلاَ يكَلّمهُ ولا يُصلحُ بينهُ و بَيْنَ امرأتهِ و يَقولُ: قَد حَلَفْتُ بِاللهِ أنْ لا أفعل وَلاَ يَحِلُّ إلاَّ أن أبرَّ في يَمِيني فأنزَلَ اللهُ هَذِهِ الآية...)}[1]، واتە: کەلبیی دەڵێ: ئەم ئایەتە دەربارەی عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحە خوا لێی ڕازی بێ، هاتۆتە خوار، لە کاتێکدا کە پەیوەندی پچڕاند لەگەڵ زاوایەکەی [(خَتَنْ)، واتە: زاوا)] کە

١) أسباب النزول، ص: (٥٤).

ناوی بیشری کوڕی نوعمان بوو، {کە خوشکی عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحەی لابووو تەڵاقی دابوو، دیارە بە ناهەق تەڵاقی داوە} وە عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحە سوێندی لێ خوارد نابێ نەبتبینم نەقسەت لەگەڵ بکەم، وە ئاشتەواییش لەنێوان خۆت و خێزانەکەتدا ناکەم و جارێکی دیکە ناتدەمەوە {ئەو خوشکەی خۆمت نادەمەوە، دیارە ئافرەتەکە دەیویست بچێتەوە لای پیاوەکەو کابراش پەشێمان بوو ئەویش دەیگوت: سوێندم خواردوە کە جارێکی دیکە ئەوە ناکەم} وە دروستیش نیە، هەر دەبێ سوێندەکەم بەرمەسەرێ، جا خوای بەخشندە ئەم ئایەتەی ناردە خوار.

## مانای گشتی ئایەتەکان

خوای بێ وێنە ڕوو لە ئێمەی ئیماندار دەکات و دەماندوێنێ دەربارەی مەسەلەیەکی زۆر گرنگ، کە ڕۆژانە دووبارە دەبێتەوە لە ژیانی هەموو لایەکماندا، وە لە ژیانی هەموو میللەتانیشدا هەیە، ئەویش مەسەلەی سوێند خواردنە، سوێندخواردنی بەجێ و سوێندخواردنی بێجێ، دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تَجْعَلُوا اللَّهَ عُرْضَةً لِّأَيْمَانِكُمْ أَن تَبَرُّوا وَتَتَّقُوا وَتُصْلِحُوا بَيْنَ النَّاسِ ﴾، واتە: بەهۆی سوێند پێ خواردنتانەوە خوا مەکەنە ڕێگرو پەرچ، کە چاکە بکەن، وە ئاشتەوایی لەنێوان خەڵکیدا بکەن، واتە: سوێند خواردنتان بە خوا ﷻ مەکەنە پاساوو ڕێگرو بیانوو، لەبەردەمی خۆتاندا کە چاکە نەکەن و پارێز نەکەن و صوڵح و ئاشتەوایی نەکەن، ئەوە واتایەکی.

واتایەکی دیکەی ئەوەیە کە ئێوە بەهۆی زۆر سوێندخواردنەوە بە خوا ﷻ، کارێکی وامەکەن زۆر سوێندخواردنتان واتان لێبکات کە خەڵك متمانەتان پێ نەکەن، وە سەرەنجام نەتوانن چاکە بکەن و پارێز بکەن و صوڵح بکەن، چونکە ئەگەر ئینسان زۆر سوێندی خوارد بە ناهەق و بە هەق، سەرەنجام خەڵك زۆر سەنگ بۆ قسەی دانانێ و متمانەی پێناکەن، وە سەرەنجام هەرکەسێك لەنێو خەڵکدا متمانەی نەبووو میصداقیەتی خۆی لە دەستدا، ناتوانێ وەك پێویست چاکەکاربێ و پارێزکاربێ، وە صوڵح و ئاشتەوایی بکات، بەڵام مانای یەکەمیان

بەهێزتـرە، کە ﴿ عُرۡضَةٗ ﴾، یـانی: ڕێگـرو پەرچ، دیارە هۆی هاتنـە خوارەوەکەشـی ئەوەیە کە عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحە سوێندی خواردبوو لە زاوایەکەی کە بیـشری کوڕی نوعمانە، خوشکەکەی نەداتەوەو دەشیگوت: دەبـێ سـوێندەکەم بەرمەسـەرێ‌و ئەگەر خوشکەکەم بچێتـەوە، تـازە سوێندەکەم لێدەکـەوێ، وە ئـەوەش پێـچەوانەی چاکەکارییـە، ئنجـا خـوا ﷻ مسـوڵمانانی قەدەغەکرد کە بەهۆی سوێند خواردنـەوە لە شـتێك کە پێچـەوانەکەی باشـتـرە لای خوا، ئەو کارە چاکە لەقیس خۆیان بدەن، کـە دوایـی لـە مەسـەلە گرنگەکانـدا زیـاتر تیـشك دەخەینەسـەر ئـەو مەسـەلەیەو لەوبارەوە چەند فەرمایشتێکی پێغەمبـەر ﷺ دەهێنینـەوە، واتـە: بـەهۆی سـوێند خواردنتانەوە، ڕێی چاکە لەخۆتان مەگرن‌و ئەو سوێندە لەبەردەم خۆتاندا مەکەنە بەربەست‌و پەرچ، بڵێی: تازە سوێندم خـواردوەو نـابێ ئەو چاکەیە بکەم، بۆ وێنـە: کەسێك سوێند دەخوا دەڵێ: سوێندم خواردوە فڵانـە کەس نەدوێنم ! ئاخر دواندنی بـرای مـسوڵمانـت، یـان خوشـکی مـسوڵمانت، یـان خزمێکـت، یـان دراوسـێیەکت چاکەیەو نەدواندنی گوناحە، بۆیە واباشـتـرە کەفارەت بـدەی‌و بگەڕێیـەوە بـۆ ئـەو چاکەیەی کـە پێـشتـر دەتکـرد، نـەك سـوێند بکـەی بـە پـەرچ‌و کۆسـپ لەبـەردەم خۆتـداو ڕێـی چاکە لـەخۆت بگـری، یـان ڕێـی پـارێزو، ڕێـی ئیـسلاح‌و ئاشـتەوایی لەخۆت بگـری ﴿ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيـمٞ ﴾، وە خوا بیسـەری زانایە، بیسەرە کە چیتـان گوتوە، وە زاناشە بە نێو دڵتـان داخۆ مەبەسـتتان چـی بـووە، ئـەوە بـە نـسبەت سوێندێك کـە بـەرێ‌و جێـبێ، واتـە: کە سوێندێك بـە دڵـی مرۆڤـدا هاتبـێ‌و، بـە هۆشیارییـەوە سـوێندەکەی خواردبێ.

ئنجا ئایەتی دووەم باسی جۆرێکی دیکە لە سوێندەکان دەکات، ئەویش سوێندی لەغوو (یَمینِ اللّغو)یە، واتـە: سـوێندێکی پـووچ‌و سـەرزارەکیی کە هـیچ یاسـایەکی شەرعیی نـەیەتە سەرێ دەفەرموێ: ﴿ لَّا يُؤَاخِذُكُمُ ٱللَّهُ بِٱللَّغۡوِ فِيٓ أَيۡمَٰنِكُمۡ ﴾، خوا لێتـان ناگرێ بەهۆی ئەو سوێندانەتانەوە کە سوێندی (لَغْو)ن، سـەرزارەکیین ﴿ وَلَٰكِن يُؤَاخِذُكُم بِمَا كَسَبَتۡ قُلُوبُكُمۡ ﴾، بـەڵام خـوا بـەهۆی ئـەو سـوێندانەتانەوە لێتـان

دەپرسێتەوە کە بەدڵتاندا هاتوون، واتە: ئەگەر سوێند بخۆی لە شتێك کە بە دڵتدا هاتبێ، دوایی بێ ئەوەی کەفارەت بدەی بچی شتەکە بکەی خوا سزات دەدات ! بۆیە دەبێ یەکەمجار کەفارەت بدەی، ئەوجار بچۆ کارەکە بکە، بەڵام هەر لەخۆڕا سوێندێکی سەرزارەکیی بخۆی، کەفارەتیش نەدەی گوناهبار نابی، هەروەك سوێند لە کارێکی خێر بخۆیو کەفارەت نەدەی، وە کارە خێرەکە لەخۆت قەدەغە بکەی گوناهە، بۆیە دەفەرمویٚ: خوا لێتان ناگرێ کە سوێندی سەرزارەکیی بخۆن (سوێندێك کە بەدڵتاندا نەهاتوە) بەڵکو ئەوەتان لێدەگرێ کە سوێندەکە بەدڵتاندا هاتبێ ﴿ وَٱللَّهُ غَفُورٌ حَلِيمٌ ﴾، خوا لێبوردەی هێدییە، لێبوردەیە ئەگەر هەڵەتان کرد لێتان دەبووریٚ، وە هێدیشە زوو سزاتان نادات.

## چەند مەسەلەیەکی گرنگ

**مەسەلەی یەکەم:** دەربارەی ئەو ڕستە قورئانییە، کە دەفەرمویٚ: ﴿ وَلَا تَجْعَلُوا۟ ٱللَّهَ عُرْضَةً لِّأَيْمَٰنِكُمْ ﴾، وەك گوتم دوو مانای هەن:

**یەکەم:** (لا تَجْعَلُوا حِلْفَكُم أو حَلِفَكُم بالله مانِعاً لَكُم مِنَ البِرِّ والتَّقوَى والإصلاَح)، واتە: سوێند خواردنتان بە خوا ﷻ، مەکەنە پەرچو کۆسپ لەبەردەم چاکەکردنو پارێزکارییو ئاشتەوایيتاندا.

**دووەم:** (لاَ تَجْعَلُوا اللهَ هَدفاً لأَيْمَانِكُم وتُكْثِروا بِهِ الحَلِفَ و لا تَبتَذلوهُ)، واتە: خوا بێنموود مەکەن بەوەی کە زۆر سوێندی پێ بخۆنو هەموو کات سوێندتان بەسەر دەم دابێو سوێندەکانتان بێنموود مەکەنو خۆتان بێ متمانە مەکەن لای خەڵکی، بەڵام وەك گوتم زیاتر هی یەکەمیان وا پێدەچێ کە مەبەست بێ، واتە: سوێندخواردنتان بە خوا مەکەنە پەرچ لەبەردەم خۆتاندا بۆ ئەوەی کە چاکە بکەن، لەوبارەشەوە چەند فەرمایشتێکی پێغەمبەر ﷺ هەن:

**فەرمایشتی یەکەم:** {(وَاللهِ، لأَنْ يَلَجَّ أَحَدُكُمْ بِيَمِينِه فِي أَهْلِهِ، آثَمُ لَهُ عِنْدَاللهِ مِنْ أَنْ يُعْطِيَ كَفَّارَتَهُ الَّتِي فَرَضَ اللهُ ﷻ) (رَوَاهُ مُسلم برقم: (٤٢٦٧)، عَن أبي هُرَيرَةَ}، واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: سوێند بە خوا ئەگەر یەکێك لە ئێوە لە نێو ماڵو خێزانو دەوروبەری خۆیدا، سووربێ لەسەر بردنەسەری سوێندەکەی (کە سوێندی لە شتێکی چاکە خواردوە نەیکات) ئەوە زیاتر پێی گوناهبار دەبێ لە لای خوا، لەوە کە ئەو کەفارەتەی کە خوا لەسەری فەرزکردوە بیدات، {کەفارەتەکەت بدەو بگەڕێوە سەر ئەو کارە خێرە نەك بڵێی تازە سوێندم خواردوە! سوێندت خواردوە ڕێی چاکەیەکت لەخۆت گرتوە بەهۆیەوە، کەفارەت بدەو سوێندەکەت هەڵوەشێنەوەو بگەڕێوە سەر چاکەکە}.

**فەرمایشتی دووەم:** {(إِنِّي وَاللهِ، إِنْ شَاءَ اللهُ، لاَ أَحْلِفُ عَلَى يَمِينٍ فَأَرَى غَيْرَهَا خَيْرًا مِنْهَا، إِلاَّ أَتَيْتُ الَّذِي هُوَ خَيْرٌ وَتَحَلَّلْتُهَا) (مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ، الْبُخَارِيُّ برقم: (٣١٣٣)، وَمُسلم برقم: (٤٢٤١)، عَنْ أَبِي مُوسَى الأَشْعَرِي رضي الله عنه}، واتە: پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: سوێند بە خوا من ئەگەر خوا بیەوێ، هیچ کاتێك سوێندێك ناخۆمو دوای ببینم کە غەیری ئەو شتەی سوێندم لێ خواردوە باشترە {واتە: واباشترە کە سوێندەکەم نەبەمە سەرێ} مەگەر دەچم ئەو کارە خێرە دەکەمو کەفارەتیش بۆ سوێندەکەم دەدەم.

پێغەمبەر ﷺ جاری وابووە سوێندی لە شتێك خواردوە، دوای ئەوەی کە تووڕە بووە، سوێندی خواردوە، دوایی کەفارەتی داوەو گەڕاوەتەوە سەر کارە خێرەکەی.

ئەبووبەکری صیددیق خوا لێی ڕازی بێ، دوای ئەوەی یەکێك لە خزمەکانی بوختانی بە عائیشە کردبوو خوا لێی ڕازی بێ، کە لە حاڵێکدا هەمیشە ئەبووبەکر هاوکاریی دەکردو خێری پێدەکرد، چونکە فەقیر بوو، سوێندی لێ خوارد کە هاوکاریی نەکات، خوای لێبوردە ئایەتی ناردە خوارێ لە سوورەتی

(النور)دا کە دەفەرموێ[1]: ﴿ وَلَا يَأْتَلِ أُوْلُواْ ٱلْفَضْلِ مِنكُمْ وَٱلسَّعَةِ أَن يُؤْتُوٓاْ أُوْلِي ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْمَسَٰكِينَ وَٱلْمُهَٰجِرِينَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ۖ وَلْيَعْفُواْ وَلْيَصْفَحُوٓاْ ۗ أَلَا تُحِبُّونَ أَن يَغْفِرَ ٱللَّهُ لَكُمْ ۗ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٢٢﴾ ﴾، واتە: ئەوانەی کە خاوەن چاکەو خوا پێداون، با سوێند نەخۆن لەوە کە یارمەتی خزمو نەدارو کۆچکەران بدەن، وە با لێیان ببوورنو چاوپۆشیی بکەن ئایا حەزناکەن خوا لێتان ببووریٚ؟ وە خوا لێبوردەی بە بەزەییە دەڵێ: ئەبووبەکر خوا لێی ڕازی بێ، گوتی: با، حەز دەکەم خوا لێم خۆشبێ، منیش ئەوە لێی بوردم، بەخوا هەرگیز لێی نابڕم، {واتە: مادام خوای میهرەبان پێی خۆشە، ئەوە من لە قسەکەی خۆم پەشێمان بوومەوە، ئیدی کەفارەتی داو گەڕایەوە سەر کارە خێرەکەی خۆی.

**فەرمایشتی سێیەم:** {(مَنْ حَلَفَ عَلَى يَمِينٍ فَرَأَى غَيْرَهَا خَيْرًا مِنْهَا فَلْيُكَفِّرْ عَنْ يَمِينِهِ وَلْيَفْعَلِ الَّذِي هُوَ خَيْرٌ) (رَوَاهُ مُسلم برقم: (٤٢٥٠)، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه}، واتە: هەر کەسێ سوێندی خواردو دوایی تەماشای کرد غەیری سوێند بردنەسەرەکەی بۆی باشترە، با کەفارەتی سوێندەکەی بداتو ئەو کارە بکات کە بەخێرو چاکەی دەزانێ.

**مەسەلەی دووەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ لَّا يُؤَاخِذُكُمُ ٱللَّهُ بِٱللَّغْوِ فِيٓ أَيْمَٰنِكُمْ ﴾، (لَغْو اليَمِين) سوێندی لەغوو چییە؟ بە چەند مانایەك لێكدراوەتەوە، بەڵام لەم فەرموودەیەدا کە ئەبو داوود لە دایكمان عائیشە خوا لێی ڕازی بێ گێڕاویەتەوە، ماناکەی زۆر ڕوون کردۆتەوە، کە فەرموویەتی: {(عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا قَالَتْ: إِنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: اللَّغْوُ فِي اليَمِينِ هُوَ كَلَامُ الرَّجُلِ فِي بَيْتِهِ: كَلَّا وَاللهِ وَبَلَى وَاللهِ) (رَوَاهُ البُخَارِيُّ برقم: (٤٦١٣)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٣٣٥٤)}،

---

١) بڕوانە: (صحيح البخاري): (٤٧٥٠)، وە (صحيح مسلم): (٢٧٧٠)، وأبو داود والترمذي والنسائي وغيرهم.

واتــە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: سوێندی (لَغْو) ئەوەیـە کـە کـابرا لـە ماڵی خۆیدا دەڵێ: بە خـوا نەخێـر، وە بـا بە خـوا وابوو، {ئاوا سـوێندی بەسـەر زاری دادێ، بێ ئەوەی کە دڵی لەسەری بچەسپێ}، ئـەوە بـاوترین مانـای (لَغْـو الیَمِـینِ)ە، واتــە: سوێندی سـەرزارەکیی، ئنجـا ئایـا بەڵگـەمان چـییە کـە ئـەوە مانـای سوێندی (لَغْو)یە؟ ئەوەیـە کـە خـوای کـاربەجێ ئـەو جـۆرە سـوێندەی بـەراورد کـردوە لەگـەڵ جـۆرە سـوێندێکی دیکـەدا کـە دەفـەرموێ: ﴿وَلَكِن يُؤَاخِذُكُم بِمَا كَسَبَتْ قُلُوبُكُمْ﴾، بـەڵام خـوا سـزاتان دەدات بـەو سـوێندانەی کـە بەدڵتانـدا هاتوون، یان وەك لە سوورەتی (الـمائدة)دا دەفـەرموێ: ﴿لَا يُؤَاخِذُكُمُ اللَّهُ بِاللَّغْوِ فِي أَيْمَانِكُمْ وَلَكِن يُؤَاخِذُكُم بِمَا عَقَّدتُّمُ الْأَيْمَانَ...﴿٨٩﴾﴾، خـوا لێتـان نـاگرێو سـزاتان نـادات بـەو سـوێندانەی (لَغْـو)ن، بـەڵام بـەو سـوێندانەتان دەتانـگرێو سـزاتان دەدات، کـە بەدڵتانـدا دێـنو دڵتـان لەسـەریان چەسـپاندوە، کەواتە: سوێندی (لَغْو) ئەو سوێندەیە کە بەسەر زارت دادێو هۆشیارانە سوێند ناخۆیو دڵت لەسـەری نەچەسـپاوە، وەك: بـەرێ وەڵـڵاهـی وابـوو، نـا وەڵـڵاهی وانـەبوو، بـەڵام ئەوەشـیان ئەگـەر بەدڵـتدا هاتبـێ، هـەر بـە سـوێندی تـەواو دادەنرێ، بەڵام بەزۆری وایە کە خەڵـك وا سوێند دەخـواو بـە دڵـی دا نایـەت، ئنجـا هەندێ لە زانایـان گوتوویانـە: سـوێندی لەغـوو، سوێندی کـاتی تـووڕەیی یـە، وە هەنـدێکی دیکـە گوتوویانـە: ئەوەیـە کـە کـابرا شـتێك کـە حـەڵاڵ بـێ لەخـۆی حـەرامی بکـات، بـۆ وێنـە بڵـێ: ئـەو شـتە لـە مـن حـەرام بێـت، وە هەندێکی دیکـە دەڵێن: سـوێندی (لَغْـو) ئەوەیە کە تۆ پێت وابـێ شـتێك بـە جۆرێکە، دوایی دەربکـەوێ بە جۆرێکی دیکەیە، بۆ وێنە: پێت وابێ فـڵان کەس هاتۆتەوە لە سەفەرێو سوێندی لەسەر بخۆی، دوایی دەربکەوێ کـە نەهاتۆتـەوە، یان پێت وابـێ بۆتـە شـەو، کەچـی جارێ ڕۆژئـاوا نەبووبـێ، بـەڵام بەهـەر حـاڵ ئەوەی یەکەمیان کە فەرمایشـتی پێغەمبەری ﷺ لەسـەرە، لـە هـەمووان زیـاتر چەمکی (یَمِینَ اللَّغـو) دەردەخـات، هەڵبەتـە دەشـگونجـێ بڵێیـن: هـەموو ئـەو

شتانە دەکەونە جوغزی چەمكو واتای سوێندی (لَغْو)ەوە.

**مەسەلەی سێیەم:** کەفارەتی سوێند: ئایا کەفارەتی سوێند چییە؟ گوتمان هەرکات مرۆڤ ویستی سوێندەکەی بشکێنێ، دەبێ کەفارەت بدات، خوا لە ئایەتی ژمارە (٨٩)ی سوورەتی (المائدة)دا باسی کەفارەتی سوێندی کردوە کە دەفەرموێ: ﴿ لَا يُؤَاخِذُكُمُ ٱللَّهُ بِٱللَّغْوِ فِيٓ أَيْمَٰنِكُمْ وَلَٰكِن يُؤَاخِذُكُم بِمَا عَقَّدتُّمُ ٱلْأَيْمَٰنَ ۖ فَكَفَّٰرَتُهُۥٓ إِطْعَامُ عَشَرَةِ مَسَٰكِينَ مِنْ أَوْسَطِ مَا تُطْعِمُونَ أَهْلِيكُمْ أَوْ كِسْوَتُهُمْ أَوْ تَحْرِيرُ رَقَبَةٍ ۖ فَمَن لَّمْ يَجِدْ فَصِيَامُ ثَلَٰثَةِ أَيَّامٍ ۚ ذَٰلِكَ كَفَّٰرَةُ أَيْمَٰنِكُمْ إِذَا حَلَفْتُمْ ۚ وَٱحْفَظُوٓاْ أَيْمَٰنَكُمْ ۚ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمْ ءَايَٰتِهِۦ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿٨٩﴾ ﴾ المائدة، واتە: خوا لێتان ناگرێ لەسەر سوێندێك کە بەسەر زارتان دادێ، بەڵکو بەو سوێندانە لێتان دەگرێ کە دڵتان لەسەریان چەسپاندوەو دڵتان لەسەریان گرێداوە، ئەوە کەفارەتەکەی بریتیە لە خواردن دانێکی مام نێوەندیی لەوەی کە دەیدەن بەماڵو خێزانی خۆتان، بە دە (١٠) نەدار (واتە: یەکی ژەمێك، دە کەسی نەدار تێر بکەی)، یان پۆشاکیان بدەیە، (هەڵبەتە پارچەیەك لە پۆشاکیش دەبێت) یان ئازادکردنی کۆیلەیەك، جا کەسێك ئەوانەی لە توانادا نەبوون، با سێ ڕۆژان بەڕۆژووبێ، ئەوە کەفارەت {سڕینەوە}ی سوێندەکانتانە ئەگەر سوێندتان خوارد، وە سوێندەکانتان بپارێزن {واتە: لەخۆڕا سوێند مەخۆن، ئەگەر سوێندیشتان خوارد مەیشکێنن، مەگەر ئەو شتەی کە سوێندتان لەسەر خواردوە شتێکی باش بێ، ئەو کاتە پێویست دەکات کەفارەت بدەی بۆ ئەوەی بگەڕێیەوە سەر کردەوە چاکەکەت) ئاوا خوا ئایەتەکانیتان بۆ دەخاتە ڕوو بەڵکو سوپاسگوزاربن.

**مەسەلەی چوارەم:** حوکمی سوێند خواردن بە غەیری خوا، یان بە غەیری یەکێك لە سیفەتەکانی خوا ﷻ، لەنێو کوردەواریی خۆماندا وا دەزانن ئەگەر دەست بەسەر قورئاندا نەدەی سوێند نیە ! نەخێر، وانیەو هەر بڵێی: بە ویستی خوا، بە زانیاری خوا، بە ڕەحمەتی خوا، بە عیززەتی خوا، بە دەسەڵاتی

خوا، یان بڵێی: بە خوا ﷻ ئەوانە هەموو سوێندن، چونکە وەك چۆن قورئان فەرمایشتی خوایە، ئەو شتانەی دیکەش ناوی خوان‌و سیفەتی خوان، ئایا سوێند بە چی دەخورێ ؟ بە خوای پەروەردگار، یان بە یەکێك لە سیفەتەکانی، وە قورئان بۆیە سوێندی پێدەخورێ، چونکە یەکێکە لە سیفەتەکانی خوا، وەك چۆن خوای بەرزو مەزن توانای هەیە، بیستنی هەیە، بینینی هەیە، ویستنی هەیە، بەزەیی هەیە، کاربەجێی هەیە، بە هەمان شێوەش فەرمایشتیشی هەیەو ئێمە بۆیە سوێند بە قورئان دەخۆین، چونکە قورئان فەرمایشتی خوایەو یەکێکە لە سیفەتەکانی خوا، سوێندی شەرعیی تەنیا ئەو سوێندەیە کە بە خوا بخورێ، یان بە یەکێك لە سیفاتەکانی خوا، وە سوێندی ناشەرعیی ئەوەیە کە بە غەیری خوا بخورێ، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {(مَنْ أحْلَفَ بِغَيْرِ اللهِ فَقَدْ كَفَرَ أو أشْرَكَ) (رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ بِرقم: (٣٢٥١)، وَالتِّرمِذِيّ بِرقم: (١٥٣٥)، وَابْنُ حِبَّانَ بِرقم: (٤٣٥٨)، عَنْ عَبْدِاللهِ بْنُ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، وَصَحَّحَهُ الألباني في (إرواء الغليل) برقم: (٢٥٦١)، وفي (السلسلة الصحيحة) برقم: (٢٠٤٢)}، واتە: هەر کەسێك سوێند بە غەیری خوا بخوات، ئەوە کوفری کردوە، یان شیرکی کردوە {بێبڕوایی کردوە، یان هاوبەشی بۆ خوا داناوە}، هەڵبەتە لێرەدا ئەوەنیە کە بۆتە کافرو هاوبەش دانەر: بەڵکو مەبەست ئەوەیە سیفەت‌و کردەوەیەکی ئەوانی تێدایە.

ئنجا ئایا کەفارەتی سوێند خواردن بە غەیری خوا چییە؟ بێگومان دەبێ ئینسان پەشێمان بێتەوەو بڵێ: خوایە تۆبە جارێکی دی سوێندی بە غەیری تۆ ناخۆم‌و پەشێمان بوومەوە، بەس پێغەمبەر ﷺ کەفارەتێکی بۆ داناوەو فەرموویەتی: {(مَنْ حَلَفَ فَقَالَ فِي حَلِفِهِ: والَّلاتِ والعُزَّى، فَلْيَقُل: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهَ...) (مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ، البُخَارِيُّ بِرقم: (٤٨٦٠)، وَمُسلم بِرقم: (٤٢٣٦)، عَنْ أبِي هُرَيرَةَ رضي الله عنه}، واتە: هەر کەسێك سوێندی خواردو لە سوێندەکەیدا گوتی: سوێند بە لات‌و سوێند بە عوززا، {(اللاتِ) کە (مؤنَّث)ی (إلهَ) و (العُزَّى) (مؤنَّث)ی (عزيز)ە، دوو بت بوون، هەروەها (المَنَاة)یش (مؤنَّث)ی (مَنَان)ە، ئەوانە بت

بـوون کـافرەکـانی مەککـە دەیانپەرسـتن هەرکەسـێ سـوێندی بـە لاتو عـوززا خـوارد، یـان بە هەر شـتێکی دیکـەش، چونکە مەرج نیە سوێند هەر بـە بـتو صـەنەم بخـورێ، بە هەر شتێکی دیکەش سوێند بخورێ، هـەر ناشـەرعـیی یـە} کەفارەتەکەی ئەوەیە بڵـێ: (لاَ إِلَـهَ إِلاَّ اللهَ) بێجگە لە خـوا هیـچ پەرسـتـراوێك نیە، بۆچی؟ چونکە سوێند خواردن بە هەر شـتێك، واتە: تۆ ئەو شـتەت بردۆتە ڕیزی خوا، سوێند یانی: چی؟ کە تۆ دەڵێی: بە خوا، واتە: خوا ئاگـادارە کـە مـن ئەو شـتـەم کردوە، یان نەمکـردوە، وە من خوا دەکەمـە پاڵپـشـتی قـسـەی خـۆم، کەواتە: کە سـوێند بە هەرشتێکی دیکـە دەخـۆی، مانـای وایـە هێناوتەتـە ڕیـزی خوای پەروەردگار، بۆیـە کەفارەتەکـەی ئەوەیـە بڵێـی: (لاَ إِلَـهَ إِلاَّ اللهَ)، بەڵگـەش لەسەر ئەوە کە سوێند تەنیا بە لاتو عوززا حەرام نیـە، بەڵکو بە هەر شـتێکی دیکەش حەرامە، ئەم فەرمایشـتەی پێغەمبەرە ﷺ کـە فەرموویـەتی: {(إِنَّ اللهَ ﷻ یَنْهَاکُـمْ أَنْ تَحْلِفُـوا بِآبَـائِکُم، فَمَـنْ کَـانَ حالِفـاً، فَلْیَحْلِـفْ بـاللهِ، أو لِیَصْمُتْ) (مُتَّفَقٌ عَلَیْهِ البُخَارِيُّ برقم: (٦١٠٨)، وَمُسلم برقم: (٤٢٣٣) عَنْ ابْنُ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ}، واتە: بێگومان خوای بـەرز لێتـان قەدەغـە دەکـات سوێند بـە بـابو باپیـرانتان بخۆن {بۆ وێنە: بە قەبری بـابی، بە سـەری بـابی، بە فـلان شـت، بە برایەتییمان، بە کەعبە، بە پێغەمبەر ﷺ} هەرکەسێك سوێند دەخوا با سوێند بە خوا بـخـوات، یـان بێدەنـگ بێ.

خـوای پەروەردگـار لـەو کەسـانەمان بگێـڕێ کـە بەڕاسـتـیش خۆیـان دەپـارێزن سوێند بە خـوا بخۆن، بە درۆ ئەوە هەر هیچ مسولمان دەبێ بەڕاستیش زۆر سوێند بە خـوای تـاك نـەخوات، خـوای بـەرزو مـەزن یـەکێك لـەو سـیفەتە خراپانـەی، کـە یەکێك لە کافرەکانی پـێ زەم دەکـات، ئەوەیـە کـە دەفـەرموێ: ﴿... حَلَّافٍ مَّهِينٍ ١٠﴾ القلم، زۆر سـوێندی دەخواردو ئینسانێکی سووك بوو، وە بەڕاسـتی ئینـسـان کە زۆر سـوێندی خـوارد بۆ هەموو شتێ، مانـای وایە زۆر متمانەی بـە خـۆی نیـەو، لە ئەنجامی ئەوەشـدا سووك دەبێـتو دادەبەزێ، دوایـی وای لێـدێ خـەڵك دەڵێت: بە سـوێندت بـڕوا ناکـەم دەبێـت تـەڵاقیش بخۆی! لەبـەر ئـەوە خـۆ دوورگـرتن لـە

سوێند خواردن شتێکی باشە، ئینسان وابێ بەرانبەرەکەی بڕوای پێبکات، ئەگەر بڕوا دەکەی ئەوە قسەی خۆم کردووەو پێویست ناکات سوێندیشی لەسەر بخۆم، هەڵبەتە ناڵێم سوێند خواردن دروست نیە، بەڵام زۆر سوێند خواردن خراپە، خوای پەروەردگار لەو کەسانەمان بگێڕێ کە لە هەموو ڕوویەکەوە پابەند دەبن بە شەریعەتی خواوە، وە بەو ئەدەبو ڕەوشتو بەها بەرزانەوە کە لەسەر مسوڵمانان پێویستە خۆیانیان پێ برازێننەوە.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی چل و هەشتەمین

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان پێنج ئایەت دەگرێتە خۆی لە سوورەتی (البقرة)، ئایەتەكانی ژمارە: (٢٢٦ تاكو ٢٣٠) لەو پێنج ئایەتەدا خوای پەروەردگار باسی سێ بابەتی گرنگ دەكات لە بواری باری كەسێتیدا:

یەكەم: مەسەلەی (ئیلاء) واتە: سوێند خواردنی مێرد لە ژنی كە نەچێتە لای.

دووەم: مەسەلەی عیددەی ئافرەتی تەڵاقدراو، ئافرەتێك كە تەڵاق دەدرێ عیددەی چەندە؟ یانی: دوای چەند ئەو ئافرەتە ئازاد دەبێ‌و دەتوانێ شووی دیكە بكاتەوە؟

سێیەم: مەسەلەی (خُلْع)، واتە: ئەوە كە ئافرەت مێردی لەخۆی دابڕنێ، وەك چۆن (طلاَق) بریتیە لەوە كە مێرد ژنەكەی ئازادو بەڕەڵڵا بكات، ئەو پێنج ئایەتە باسی ئەو سێ مەسەلە گرنگە دەكەن.

﴿ لِّلَّذِينَ يُؤْلُونَ مِن نِّسَآئِهِمْ تَرَبُّصُ أَرْبَعَةِ أَشْهُرٍ فَإِن فَآءُو فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٢٢٦﴾ وَإِنْ عَزَمُوا۟ ٱلطَّلَٰقَ فَإِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿٢٢٧﴾ وَٱلْمُطَلَّقَٰتُ يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ ثَلَٰثَةَ قُرُوٓءٍ وَلَا يَحِلُّ لَهُنَّ أَن يَكْتُمْنَ مَا خَلَقَ ٱللَّهُ فِىٓ أَرْحَامِهِنَّ إِن كُنَّ يُؤْمِنَّ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ وَبُعُولَتُهُنَّ أَحَقُّ بِرَدِّهِنَّ فِى ذَٰلِكَ إِنْ أَرَادُوٓا۟ إِصْلَٰحًا وَلَهُنَّ مِثْلُ ٱلَّذِى عَلَيْهِنَّ بِٱلْمَعْرُوفِ وَلِلرِّجَالِ عَلَيْهِنَّ دَرَجَةٌ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٢٢٨﴾ ٱلطَّلَٰقُ مَرَّتَانِ فَإِمْسَاكٌۢ بِمَعْرُوفٍ أَوْ تَسْرِيحٌۢ بِإِحْسَٰنٍ وَلَا يَحِلُّ لَكُمْ أَن تَأْخُذُوا۟ مِمَّآ ءَاتَيْتُمُوهُنَّ شَيْـًٔا إِلَّآ أَن يَخَافَآ أَلَّا يُقِيمَا حُدُودَ ٱللَّهِ فَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا يُقِيمَا حُدُودَ ٱللَّهِ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِمَا فِيمَا ٱفْتَدَتْ بِهِۦ تِلْكَ حُدُودُ ٱللَّهِ فَلَا

تَعْتَدُوهَا وَمَن يَتَعَدَّ حُدُودَ اللَّهِ فَأُولَٰئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ ﴿٢٢٩﴾ فَإِن طَلَّقَهَا فَلَا تَحِلُّ لَهُ مِن بَعْدُ حَتَّىٰ تَنكِحَ زَوْجًا غَيْرَهُ فَإِن طَلَّقَهَا فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِمَا أَن يَتَرَاجَعَا إِن ظَنَّا أَن يُقِيمَا حُدُودَ اللَّهِ وَتِلْكَ حُدُودُ اللَّهِ يُبَيِّنُهَا لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ ﴿٢٣٠﴾ ﴾.

## مانای وشە بە وشەی ئایەتەكان

((ئەوانەی سوێند لە ژنەكانیان دەخۆن نەچنە لایان (واتە: لەگەڵیان جووت نەبن)، چوار مانگ چاوەڕێ كردنیان بۆ هەیە، جا ئەگەر گەڕانەوە (بۆ چوونە لایان) ئەوە خوا لێبوردەی بە بەزەییە ﴿٢٢٦﴾ بەڵام ئەگەر بڕیاری تەڵاقیاندا، ئەوە خوا بیسەری زانایە ﴿٢٢٧﴾ وە ژنانی تەڵاقدراو چاوەڕێ دەبن و خۆیان مەرزەم دەكەن هەتا سێ پاكیی (یان سێ حەیز) ڕادەبرن، وە ئەگەر بڕوایان بە خواو بە ڕۆژی دوایی هەبێ، بۆیان ڕەوا نیە ئەوەی كە خوا لە منداڵدانەكانیاندا دروستی دەكات بیشارنەوە، وە مێردەكانیشیان لەو ماوەیەدا شایستەترن بە گێڕانەوەیان (بۆ لای خۆیان) ئەگەر مەبەستیان چاكسازیی بێ، وە ژنان وەك ئەو ئەركەی لەسەریانە مافیشیان هەیە بە شێوەیەكی بە چاك زانراو، وە پیاوان پلەیەكیان بە سەریانەوە هەیە وە خوا زاڵی كاربەجێیە ﴿٢٢٨﴾ تەڵاقدان دوو كەڕەتە (تەڵاقدانی كە بگونجێ ژن و مێرد بگەڕێنەوە لای یەك) دوایی یان دەستپێوەگرتنێكی باش، یان دەستلێبەردانێكی چاكەكارانە، وە بۆتان ڕەوانیە هیچ شتێك لەوەیان لێ وەربگرنەوە كە پێتان داون، مەگەر (وێك هەڵنەكەون و) بترسێن كە یاساكانی خوا بەڕێوە نەبەن (واتە: ژن و پیاو) ئەوە گوناهیان ناگاتێ لەوەدا كە ژنەكە بە قەرەبوو (فِدیَة) خۆی دەرباز بكات، ئەوانە سنوورەكانی خوان، دەجا مەیانبەزێنن، وە هەركەسێك سنوورەكانی خوا بشكێنێ، ئەوە هەر ئەوانەن ستەمكار ﴿٢٢٩﴾ ئنجا ئەگەر (بۆ جاری سێیەم) تەڵاقیدا ئەوە (ئەو ژنە) بۆی ڕەوانیە بچێتەوە لای (مێردەكەی) هەتا مێردێكی دیكە نەچێتە لای (واتە: دەبێ مێردێكی دیكە بكات لەگەڵیشی جووتبێ)، جا ئەگەر (ئەویش) تەڵاقیدا، ئەوە گوناهیان ناگات كە بگەڕێنەوە لای یەك، ئەگەر

پێیان وا بوو کە یاساکانی خوا (لەنێو خۆیاندا) بەرپا دەکەن، وە ئەوانە سنوورەکانی خوان بۆ کەسانێکیان ڕوون دەکاتەوە کە دەزانن﴿٢٣٠﴾)).

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(**يُؤْلُونَ**): (الأَلِيَّة: الحَلِفُ و الإِيلاء في الشَّرْع: هُوَ الحَلِفُ المانِعُ مِنْ جِمَاعِ الْمَرأَةِ، وآلَيْتُ: أي حَلَفْتُ)، واتە: (أَلِيّة) یانی: (حَلِف) ئەویش سوێندە، بەڵام ئایا لە زاراوەی شەرعدا (ئیلاء) چییە؟ جۆرە سوێندێکی تایبەتە، کە ڕێگربێت لەوەی پیاو بچێتە لای خێزانیو لەگەڵی جووتبێت، وە (آلَيْتُ) واتە: سوێندم خوارد.

(**تَرَبُّصُ**): (التَّرَبُّصُ: الإنتِظَار بالشَيء سِلْعَةً كانَت يَقصِدُ بِهَا غَلاءً أو رَخْصاً، أو أمراً يُنتَظَرُ زَوَالُهُ)، واتە: (تَرَبُّصُ) بریتییە لە چاوەڕێ کردنی شتێك، چ کەلوپەلێك بێت بتەوێ نرخی گران بێت، یان هەرزان بێت، یان هەر شتێك بتەوێ ئەو شتە لابچێت.

(**فَآءُو ا**): (يَعني رَجَعوا) واتە: گەڕانەوە، (الفَيءُ والفيئَةُ: الرُجُوعُ إلى حَالَةٍ مَحمُودة، والفَيءُ هُوَ الظِلُ الرَاجع)، واتە: وشەی (الفيئةُ) یانی: گەڕانەوە بۆ حاڵەتێکی باش، وە وشەی (الفيء): بریتییە لە سێبەرێك کە دەگەڕێتەوە شوێنی پێشێی.

(**عَزَمُواْ**): (العَزْمُ والعَزِيْمَةُ: عَقد القَلْبِ علَى إمضَاءِ الأمر، يُقَالُ: عَزَمْتُ الأمرَ وعَزَمْتُ عَلَيهِ) واتە: (عَزْم و عَزِيْمَةُ): گرێدانی دڵە لەسەر تێپەڕاندنی شتێ، کە دڵی خۆت بچەسپێنی لەسەر ئەوەی ئەو شتە بکەی، دەگوترێ (عَزَمْتُ الأمرَ وعَزَمْتُ عَلَيهِ)، هەردووکی واتە: بڕیاری یەکجارییم لەبارەی ئیشەکەوە داوە.

(ٱلطَّلَٰقَ): (أَصْلُ الطَّلاَقِ: التَخْلِيةُ مِنَ الوَثَاقِ...) واتە: (طَلاَق): لە زمانی عەرەبیدا بریتییە لە بەرهەڵدانی شتێك لە پەتێك یان كۆتو بەندێك، كە پێیەوە بەستراوەتەوە، (يُقَالُ أَطْلَقْتُ البَعِيرَ مِن عِقالِهِ وطَلَّقتُهُ وَهُوَ طَالِقٌ وَطَلْقٌ: بِلا قَيد...)، واتە: دەگوترێ: وشترەكەم لەو پەتەی پێی بەسترابۆوە بەرهەڵداكرد، وە دەگوترێ (طلّقتهُ وهُوَ طَالِقٌ)، واتە: بەرهەڵدام كردو ئەو بەرهەڵدایە، (وطَلْقٌ) واتە: هیچ ئەوسارو پەتی پێوەنییە. (وطَلَّقْتُ المَرأَةَ فَهِيَ طَالِق: أي مُخَلاَّةٌ عَن حِبالَةِ النِكاحِ)، واتە: ژنەكەم تەڵاقدا یانی لە پەتو پێوەندی ژنو مێردایەتی دەربازی بوو.

(قُرُوٓءٍ): كۆی (قُرْءٍ)ە، هەم بە بۆر (ضَم) هەم بە سەر (فَتح)، كە هەم بەمانای حەیز هاتووەو هەم بەمانای پاكیی ئافرەت هاتوە، (قَرَأَتِ المَرأَةُ: أي رأَت الدَّمَ، وَقَرأَت: صَارَت ذَات قُرْءٍ، والقُرءُ: اسمُ للدُخُول في المَحِيضِ عَن طُهرٍ فَهُوَ اسم جَامع للأمرَينِ)، واتە: ئافرەتەكە كەوتە حەیزەوە، خوێنی بینی، وە دەشگوترێ: (قَرَأَتِ المرأةُ) واتە: (طَهُرَت) پاكبۆوە لە خوێنی حەیز، بۆ هەردووكیان بەكار دێ.

(وَبُعُولَتُهُنَّ): (البَعْل: الذَّكَرُ مِنَ الزَّوجَينِ وَجَمعُهُ: بعُولَة نَحْو: فَحلْ وفحُولَة، والبِعَالُ كِنَايَة عَنِ الجِمَاع)، واتە: (بَعْل) واتە: مێرد، كۆیەكەی (بعُولَة)یە، وە (بَعْل) بریتییە لەوەی كە نێرە، لە ژنو مێردان، (واتە: پیاوەكە)، وە كۆیەكەی (بعُولَة)یە، وەك (فَحلْ وفُحُولَة) (فَحل) واتە: نێر، نێرەی ئاژەڵ، كۆیەكەی (فحُولَة)یە وە (بعالَ)یش (كِنَايَة)یە بۆ جووتبوون.

(بِٱلْمَعْرُوفِ): كە لە قورئاندا زۆر هاتوە، واتە: بە چاكیی، یان بە شێوەیەكی بە چاك زانراو، جا ئایا ئەوە لە چییەوە هاتوە؟ (المَعْرِفَةُ والعِرْفَانُ: إدرَاكُ الشَيء بتَفَكُّرٍ وتَدَبُّرٍ في أثَرِهِ وهُوَ أخَصّ مِنَ العِلْمِ ويُضادُّهُ الإنكار، والمَعْرُوف اسمُ لِكُلِ فعلٍ يُعرَف بالعَقلِ أو الشَّرْعِ حُسْنُهُ) واتە: هەركام لە (المَعْرِفَةُ

والعِرْفَانُ) بریتیه له زانینی شتێك له ئەنجامی بیــركردنەوەو تێوڕامانـدا لـه سەرەنجامەكەی، وە ئەوە تایبەتتـرە لە عیلم، {بۆیـه عـیلم بـۆ خـوا بەكـاردێ بەڵام (معرفة) بۆ خوا بەكارنایه، چونكه خوا پێویستی بەوە نیه بیـربكاتەوە، ئنجا شت بزانیٚ‌و پێویستی بەوە نیه له سەرەنجامەكەی وردبێتـەوە، ئنجا شـت بزانیٚ، بەڵكو هەر له سـەرەتاوە هـەموو شـتەكان دەزانـیٚ، بۆیـه عـیلم سـیفەتی خوایـه، بـەڵام نـاگوترێ مەعریفـەت یەكێكـه لـه سـیفەتەكانی خـوا ﷻ } وە پێچـەوانەی مەعریفەت بریتیه لـه نكووڵـیی لێكـردن، وە (مَعْرُوف) نـاوە بـۆ هەر شـتێك كه بە عەقڵ یان شەرع چاكییەكەی بزانرێ‌و، بزانرێ كه پەسندە، {وە بـه تەئكـید عـەقڵ‌و شـەرعیش پـشتگیـریی یەكـدی دەكـەن‌و، هـەر شـتێك شەرع بە چاكی بزانیٚ عەقڵیش دەڵیٚ ڕاست دەكەی‌و، هەر شتێك عەقڵی سەلیم بە چاكی بزانیٚ، شـەرعیش دەڵـێ ڕاسـت دەكـەی}.

(دَرَجَةٌ): (الدَرَجَةُ نَحو الـمَنـزِلَة)، واته: پله، بەڵام لێرەدا وشەی (دَرَجَة) مـەبەستێكی تایبەتی هـەیه بەپێی سـیاقی ئایەتەكـه، وەك دوایی ڕوونـی دەكەینەوە.

(فَإِمْسَاكُۢ): (إمْسَاكُ الشَيء: التعَلُّق بـهِ وَحِفظـهُ)، واتـه: (إمْسَاك) بریتـیه لـه گرتنی شـتێك‌و پاراستنی، (يُقَـالُ تَمَسَّكتُ بِهِ ومَسَكْتُ بِهِ وَأَمْسَكْتُ عَنْهُ كَذَا: أي منعتُه)، دەگوترێ: (تَمَسَّكتُ بِهِ ومَسَكْتُ بِهِ): گرتم، بەڵام (أمْسَكْتُ عَنْهُ): ڕێگام لێگرت، ﴿ فَإِمْسَاكُۢ بِمَعْرُوفٍ ﴾، واتـه: ئافرەتـەكه لەگەڵ خۆت بـه چاكه بهێڵـەوە ﴿ أَوْ تَسْرِيحُۢ بِإِحْسَٰنٍ ﴾، یـان بـه جـوانی بەرهەڵـدای بكـه، بـا بـەڕێی خۆیـدا بـڕوا.

(تَسْرِيحُۢ): (الـسَّرْحُ: شَـجَـرَةٌ لَـهُ ثَمَرٌ، الواحِدَةُ: سَرْحَةٌ، وسَـرَحْتُ الإبـلَ، أصْلُهُ أنْ تُرْعِيَـهُ الـسَّرْحَ : ثُمَّ جُعِلَ لِكُلِّ إرْسَالٍ فـي الـمَرْعى، والتَّـسْرِيحُ فـي الطَّـلاقِ، مُسْتَعارٌ مِن تَسرِيح الإبلِ كالطَّلاق في كونهِ مُسْتَعَاراً من إطلاقِ الإبـلِ) واته: ئەسڵی وشەی (تَسرِيح) لە (سَرْح)ەوە هاتوە، (سَرح)یش درەختێكه بـەری

هەیە تاکەکەی بریتیە لە (سَرْحَةٌ)، وە لە زمانی عەرەبیدا دەڵێ (سَرَحْتُ الإبِلَ) وشترەکەم بەرهەڵدا کرد، واتە: لێی گەڕام لە درەختی (سرح)دا بلەوەڕێ، دوایی هەموو جۆرە بەرهەڵدانێکی پێی گوتراوە: (تسریح)، دیارە ئەوەش (کنایة)یە بۆ تەڵاق و خوازراوەتەوە بۆ ئەوە کە پیاو دەست لە خێزانی بەربدا.

(حُدُودَ ٱللَّهِ): (الحَدُّ: الحائلُ بَيْنَ شَيْئَيْنِ الذي يَمْنَعُ اختلاط أَحَدِهِمَا بالآخر، وَحَدُّ الزِّنا والخَمر سُمِّيَ به لِكونِهِ مانِعَاً لِمعاطاتِهِ) واتە: (حَدّ): کە کۆیەکەی (حدود)ە، بریتیە لە پەردەیەك کە دەکەوێتە نێوان دوو شتان و نایەڵێ تێکەڵی یەکدی ببن، خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿تِلْكَ حُدُودُ ٱللَّهِ﴾، ئەوانە سنوورەکانی خوان، چونکە ئەگەر مرۆڤ لەو سنوورە دەرچوو بۆ ئەو دیو، تووشی حەرام دەبێت، وە سزای زیناو شەراب بۆیە پێیان گوتراوە: (حَدّ) چونکە بەربەستێکەو پەردەو نێوانێکە ناهێڵێ ئینسان تووشی ئەو گوناهە بێ {کە بزانێ سزای دەدرێ، ئەوەی عەقڵی هەبێت ئەو سزایە نایەنێتە سەرخۆی}.

(ٱفۡتَدَتۡ بِهِۦ): واتە: خۆی پێ دەکڕێتەوە، یان دەیکاتە بەلاگێڕی خۆی، یان دەیکاتە قەرەبووی خۆی، دەڵێ: (الفِدَى وَالفِدَاءُ: حفظُ الإنسانِ عَن النّائِبَةِ بِمَا يبْذُلُهُ عَنهُ)، واتە: (الفِدَى وَالفِدَاءُ): بریتیە لەوەی کە ئینسان خۆی بپارێزێ لە بەڵایەك بەهۆی پارەیەکەوە کە سەرفی دەکات {ئەو ئافرەتە کە دەیەوێ لەو مێردەی دەربازبێت، مارەییەکەی بۆ ڕەتدەکاتەوە، مانای وایە قەرەبوویەك دەداتە ئەو مێردەی بۆ ئەوەی کە دەربازی بێت}، (وافْتَدى: إذَا بَذلَ ذَلِكَ عَن نَفْسِهِ)، (افْتَدى)، واتە: ئەو شتەی کردە قەرەبووو بەلاگێڕی خۆی.

(تَنكِحَ): (أَصْلُ النِّكَاحِ للعَقْدِ، ثُمَّ اسْتُعِيرَ للجِماع)، واتە: ئەسڵی نیکاح لە زمانی عەرەبیدا بە مانای گرێبەستە، (مارەکردن) دوایی خوازراوەتەوە بۆ جووتبوون، چونکە لێرەدا کە وانەبێت، ماناکەی ڕاست دەرناچێ، واتە لە ئەسڵدا بە مانای مارەکردن و گرێبەستە، بەڵام خوازراوەتەوە بۆ جیماع ئەویش تەنیا لەو ئایەتەدا پێم وایە بەو مانایە هاتوە، کە دوایی باسی دەکەین.

## هــۆی هاتنــە خوارەوەی ئایەتەکــان

١) هۆی هاتنـە خـوارەوەی ئـەو ڕسـتەیە، کـە دەفـەرموێ: ﴿ لِّلَّذِينَ يُؤْلُونَ مِن نِّسَآئِهِمْ تَرَبُّصُ أَرْبَعَةِ أَشْهُرٍۖ فَإِن فَآءُو فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٢٢٦﴾ وَإِنْ عَزَمُوا۟ ٱلطَّلَٰقَ فَإِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿٢٢٧﴾ ﴾، {(عَـنِ ابْـنِ عَبَّـاسٍ رضي الله عنه قَـالَ: كَـانَ إيـلاء أهـل الجَاهِلِيَـة الـسنة والـسنتينِ وَأَكْثَرُ مِنِ ذَلِـكَ، فَوقَّتَ الله أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ، فَمَنْ كَانَ إيلاؤه أقل من أَرْبَعَةِ أشهرٍ فَلَيْسَ بـإيلاءٍ. وقـالَ سَعيد بـن المُسَيِّب: كَانَ الإيـلاءُ ضِرارَ أهـل الجاهلية: كَانَ الرَّجُلُ لا يُريدُ المرأةَ ولا يُحب أن يتزوّجَها غيره، فيحلفُ أن لايقرَبها أبـداً، وَكَـانَ يَتـرَكُهَـا كَـذَلِكَ لاَ أيِّمـاً ولا ذات بَعـلٍ: فجعـلَ الله تعالـى الأجلَ الـذي يعلـمُ بـهِ مـا عنـدَ الرّجل فـي الـمرأة أربعـة أشهرٍ، فَأَنْزَلَ اللهُ تَعَالـى هَـذِهِ الآيـة: ﴿ لِّلَّذِينَ يُؤْلُونَ مِن نِّسَآئِهِمْ ﴾)}[١]، واتــە: عەبدوڵــلای کــوڕی عەببــاس خــوا لــە خــۆیو بــابی ڕازی بــێ دەڵــێ: خــەڵکی ســەردەمی نــەفامیی سـوێندیان دەخـوارد لـە خێزانیـانو سـاڵێك دوو سـاڵ نەدەچوونە لای خێزانیـان، بەڵکو جاری وابوو زیاتریش لەوە، جا خوا چوار مانگی کردە کاتێکی دیاریکراو بۆ ئەو جۆرە سوێندە، بۆیە هەر کەسێك سوێندی لە خێزانی خوارد کە چوار مـانگ کەمتـر نـەچێتـە لای، {بـۆ وێنــە: گـوتی: مانگــێك نایەمـە لات، دوو مـانگ، سـێ مانگ} ئەوە بە ئیـلاء دانـانرێ، هـەتا دەگاتە چوار مانگ، کە گەیشتە چوار مانگ بە ئیـلاء دادەنرێ، {جا ئایا جیاوازیی چییە؟ جیـاوازیەکەی ئەوەیـە کـە کـابرا ئەگەر سوێندی خوارد بۆ ماوەی چوار مانگ زیـاتر، وە چوار مانگەکـە تێپـەڕین، ئافرەتەکــەی بــۆی هەیــە بــچێت داوای جیابوونــەوە بکــات، جــا ئەگــەر کــابرا دەستبەرداری بوو باشـە، بەڵام ئەگەر پەشێمان بۆوەو دەستبەرداری نـەبوو؟ ئـەوە قـازی پـێی تەڵاق دەدا}مادام ژنەکەی سووربێ لەسەر جیـابوونەوە.

---

١) (أسباب النزول للنيسابوري، ص (٥٤ - ٥٥).

وە سەعیدی کوڕی (موسەییب)یش دەڵێ: ئیلاء واتە: ئەو جۆرە سوێند خواردنە، زیان پێگەیاندنی خەڵکی سەردەمی نەفامیی بوو بە ژنەکانیان، پیاو جاری وا هەبوو کەیفی بە ژنەکەی نەدەهاتو حەزیشی نەدەکرد تەڵاقی بداتو بۆخۆی مێردێکی دیکە بکاتەوە، بۆیە سوێندی دەخوارد هەرگیز نایەمەلاتو نەدەچووە لایو لێی نەدەگەڕا نە ببێتە بێوەژنو نە ببێتە خاوەن مێردیش {هیچ لای نەبوون نە ئەوە بوو لەژێر نیکاحی پیاوەکە بچێتە دەرێو بۆخۆی ئازادبێو، نە ئەوەش بوو مێردیشی هەبێو مێردەکەی وەك مێردێك مامەڵەی لەگەڵدا بکات} بۆیە خوا ﷻ چوار مانگی دانا بۆ ئەوەی دەربکەوێ، ئایا ئەو پیاوە ئەو ئافرەتەی دەوێ یان نا؟

کەواتە: ئەو یاسا شەرعییانە هەموویان بۆ چارەسەری گرفتو کێشە هاتوونە خوارو، هەمووشیان بەرگریین لە ئافرەتان، ئافرەت چۆن تەماشاکراوە ؟! کابرا سوێندی لە خێزانی دەخوارد بە حەیاتی نایەم بۆ لاتو ئامادەش نەبوو دەستی لێ هەڵبگرێو ئەدی ئافرەتەکە؟ هەقی نەبوو داوای تەڵاقیش بکات!!

٢) هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو ئایەتە، کە دەفەرموێ: ﴿ ٱلطَّلَٰقُ مَرَّتَانِۖ فَإِمۡسَاكُۢ بِمَعۡرُوفٍ أَوۡ تَسۡرِيحُۢ بِإِحۡسَٰنٍۗ ﴾، واتە: تەڵاق دان دوو کەڕەتە {نەك دوو (طلقة)یە، نەیفەرمووە: (الطلاق طلْقتان)، جا ئەوە لە مێشکتاندا بچەسپێنن، چونکە ئەوە دوایی ئیشمان پێیەتی}، واتە: ئەو تەڵاقەی کە دروستە پیاو ئافرەتەکەی بێنێتەوە لای خۆی، دوو جارە، کەڕەتێك تەڵاقی داوە بۆی هەیە بیهێنێتەوە لای خۆی، کە تەڵاقێکی دیکەشیدا، هەر بۆی هەیە بیهێنێتەوە لای خۆی، بەڵام کە بوو بە سێیەم جار، بۆی نیە بیهێنێتەوە لای خۆی، وەك دوایی باسی دەکەین. {(رَوى ابْنُ أَبي حَاتم عَنْ عُروَةَ رضي الله عنه أَنَّ رَجُلاً قَالَ لامرأتهِ: لاَ أُطَلِّقُكَ أَبَداً، وَلاَ آويكِ أَبَداً، قَالَتْ: وَكَيْفَ ذَلِكَ؟ قَالَ: أُطَلِّقُكِ حَتَّى إِذَا دَنَا أَجَلُكِ رَاجَعْتُكِ! فأَتَت رَسُول الله ﷺ فَذكرتْ ذَلِكَ لَهُ فأَنزَلَ اللهُ ﷻ: ﴿ ٱلطَّلَٰقُ مَرَّتَانِۖ ... ﴾)}[1]،

---

١) (المصباحُ المنير في تهذيب تفسير ابن كثير)، ص: (١٦٦ - ١٦٧)، وأسباب النزول للنيسابوري، ص: (٥٥).

واتە: ئیبنو ئەبی حاتیم لە عورووەوە دەگێڕێتەوە، کە پیاوێك لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ بە ژنەکەی خۆی گوت: هەرگیز دەستت لێ بەرنادەم، وە ناشتخەمە ژێر سێبەری خۆمەوە، ئافرەتەکە گوتی: ئینجا چۆن؟ {نە خاوەن مێردبێ‌و نەبێ مێردیش بێ} گوتی: تەڵاقت دەدەم هەتا کە کاتەکەت نزیك بۆوە، دەڵێم ئەوە گێڕامیەوە ژێر نیکاحی خۆم، دوایی دووبارە تەڵاقت دەدەم {بەبێ ئەوەی بچێتەوە لای، هەروا بەو شێوەیە، چونکە ئەوکات خۆ تەڵاق یەك‌و دووو سێ‌و دەو هەزار... نەبووە ! بەڵکو شەریعەتی ئیسلامیی کردی بە سێ، گوتی: تەڵاق دەبێ سێ کەرەت بێ، دوو کەرەتان پیاو بۆی هەیە ژنەکەی تەڵاق بدا واتە: دوو تەڵاق (طلقة)، ئنجا بیهێنێتەوە ژێر نیکاحی خۆی، بەڵام کە بوو بە سێ لێك دەترازێن}، ئنجا ژنەکە چووە لای پێغەمبەرو بۆی باسکرد، خواش (﴿ٱلطَّلَٰقُ مَرَّتَانِ...﴾)ی ناردە خوار: {وەك چۆن ماوەی سوێند خواردنی مێرد لە ژنی سنووردار کرد، ژمارەی تەڵاقدارنیشی سنووردار کرد}.

٣) هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو ڕستەیە، کە دەفەرموێ: ﴿ وَلَا يَحِلُّ لَكُمْ أَن تَأْخُذُوا۟ مِمَّآ ءَاتَيْتُمُوهُنَّ شَيْـًٔا ﴾، وە بۆتان حەڵاڵ نیە ئەو مارەییەی یان ئەو دیارییانەی کە دەیدەن بە هاوسەرانتان، دوای ئەوەی تەڵاقیان دەدەن، بۆتان نیە هیچیان لێوەربگرنەوە لەوبارەوە ئەم بەسەرهاتە هەیە، کە ئەم ڕستە قورئانییەی بۆ هاتۆتە خوار: {(قَالَ الطَبَري عَن ابن جُرَيج، قالَ: نَزَلَتْ هَذِهِ الآية في ثابِتِ بْنِ قَيْسٍ و في حَبِيْبَة قَالَ: وقَدْ كَانت اشتكته إلى رَسُولِ الله ﷺ فَقَالَ رَسُولُ الله ﷺ: أتَرُدِّينَ عَلَيهِ حَدِيقَتَهُ؟ قَالَتْ: نَعَمْ، فدعاهُ رَسُول الله ﷺ فذَكَرَ ذَلِكَ لَهُ فَقَالَ: ويَطيبُ لي ذَلِكَ يَا رَسُولَ الله ﷺ؟ قَالَ: نَعَمْ، قَالَ ثَابِت: قَدْ فَعَلْتُ، فَنَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةَ...)}[1]، واتە: تەبەریی دەڵێ: ئیبنو جورەیج گوتوویەتی: ئەم ئایەتە دەربارەی سابیتی کوڕی قەیس‌و حەبیبەی خێزانی هاتە خوار، ئەویش ئەوە بوو کە حەبیبە دەچێ بۆ لای پێغەمبەر ﷺ سکاڵای خۆی لەلای

---

١) (جامع البيان) للطبري، ج: (٢)، ص: (٥٢٠)، برقم: (٤٤٦٧).

وی دەکات، دەڵێ: بەو مێردەم ڕازینیم، پێغەمبەری خوا ﷺ پێی دەفەرموێ: ئامادەی باغەکەی بدەیەوە؟ {وا دیارە سابیت باغێکی مارەیی داوە بەو حەبیبەی خێزانی، واتە: ئامادەی مارەییەکەی بۆ بگێڕیەوە ؟} دەڵێ: بەڵێ، پێغەمبەریش ﷺ بانگی سابیت دەکاتو بۆی باس دەکات، {کە خێزانەکەت هاتووەو دەڵێ پێی ڕازی نیم، دیارە ئامادەشە باغەکەت بداتەوە} ئەویش دەڵێ: (وَيَطِيبُ لِي ذَلِكَ يَا رَسُولَ الله ﷺ ؟) ئنجا ئایا ئەی پێغەمبەری خوا بۆم حەڵاڵە مارەییەکەی لێ وەربگرمەوە ؟ دەفەرموێ: بەڵێ، {مادام ئەو بە تۆ ڕازی نیەو وەختی خۆی تۆی لەبەرچاو بووە، ئێستا دەڵێ: پێی ڕازی نیم تۆش بۆت هەیە مارەییەکەی لێوەربگریەوە} ئیدی سابت دەڵێ: ئەوە من ئەوەم کردو وازم لێهێنا.

دیارە ئەو مەسەلەیە تەفصیلاتی دیکەی هەیەو پێویستی بە ڕوونکردنەوەی زیاتر هەیەو لە مەسەلە گرنگەکاندا باسی دەکەین.

## مانای گشتی ئایەتەکان

خوای پەروەردگار ڕوو لە ئیمانداران دەکاتو چەند مەسەلەیەکی گەورەو گرنگی خێزانیی یان بۆ دەخاتە ڕوو کە بەدرێژایی مێژوو کۆمەڵگاکانی بەشەر تێیاندا دووچاری هەڵەو لادانی زۆر بووەو دەبیّو دەفەرموێ: ﴿ لِّلَّذِينَ يُؤْلُونَ مِن نِّسَآئِهِمْ تَرَبُّصُ أَرْبَعَةِ أَشْهُرٍ ﴾، بۆ ئەوانەی کە سوێند لە ژنەکانیان دەخۆن کە نەچنە لایان، چوار مانگ چاوەڕوانیی هەیە ﴿ فَإِن فَآءُو ﴾، جا ئەگەر لە میانەی ئەو چوار مانگەدا گەڕانەوە بۆ لای ژنەکانیان {سوێندیان خواردوە کەفارەت دەدەنو دەچنەوە لای ژنەکانیان} ﴿ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴾، بێگومان خوا لێبوردەی بەبەزەیی یە، {کابرا تووڕە بووەو سوێندی خواردوە کە نەچێ بۆ لای خێزانیو گوتوویەتی: چاوم بە چاوت ناکەوێ، یان دەستم بە دەستت ناکەوێ، دوایی پێش ئەوەی ئەو چوار مانگە تێپەڕێ، جاری وا هەیە پێش ئەوەی ڕۆژێك تێپەڕێ،

مانگێك تێپەڕێ، پەشێمان دەبێتەوە، ئەوە هەر ژن و مێردی ئاسایی یەكدین‌و پیاوەكە كەفارەت دەدات} ﴿ وَإِنْ عَزَمُوا۟ ٱلطَّلَٰقَ ﴾، بەڵام ئەگەر ئەوانەی سوێندیان لە خێزانەكانیان خواردوە نەچنە لایان، بڕیاری دەست لێ هەڵگرتنی ژنەكانیانداو، عەزمیان جەزم كرد لەسەر تەڵاق ﴿فَإِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴾، ئەوە بێگومان خوا بیسەری زانایە، ئەمە ئەوەی لێ وەردەگیرێ، كە خودی سوێند خواردنی پیاو لە ژنی كە نەچێ بۆ لای، بە تەڵاق دانانرێ، بۆیە دوایی دەفەرموێ: ﴿ وَإِنْ عَزَمُوا۟ ٱلطَّلَٰقَ ﴾، ئەگەرنا، ئەگەر هەر بۆخۆی بە تەڵاق دانرابایە، كە ماوەكە تێدەپەڕی، لێك جیادەبوونەوە، بەڵام نەء، خودی سوێند خواردنی پیاو لە ژنی كە نەچێتە لای، بە تەڵاق دانانرێ، بەڵام ئافرەتەكە مافی هەیە بچێ سكاڵای خۆی بكات‌و بڵێ: مادام ئەو پیاوە نایەت بۆ لام‌و وەك هاوسەرو خێزان مامەڵەم لەگەڵ ناكات، لێی جیادەبمەوە، دیارە دوایی ڕوونكردنەوەی زیاتر لەوبارەوە دەدەین.

ئنجا دێتە سەر باسی عیددەی ئافرەتانی تەڵاقدراوو دەفەرموێ: ﴿ وَٱلْمُطَلَّقَٰتُ يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ ثَلَٰثَةَ قُرُوٓءٍ ﴾، وە ژنانی تەڵاقدراو چاوەڕێ دەكەن‌و خۆیان مەرزەم دەكەن، هەتا سێ حەیز یان سێ پاكییان بەسەردا دێن، (قُرُوء) كۆی (قُرْءَ) یان كۆی (قَرْءَ)ەو هەم بەمانای حەیز هاتوەو هەم بە مانای پاكیی دوای حەیز هاتوە، واتە: ئافرەتێك كە تەڵاق دەدرێ دەبێ سێ حەیزان بشوات، یان سێ پاكیی بەسەر دابێن، ئەمجار ئەو ئافرەتە ئەگەر پیاوەكەی پێش ئەوەی ئەو سێ حەیزانە بشوات، لەو میانەدا هێنایەوە لای خۆی، ئەوە هەر خێزانیەتی‌و تەڵاقێكی كەوتوەو دوو تەڵاقی ماون، بەڵام ئەگەر نەیهێنایەوە تا عیددەی تێدەپەڕێ، ئەوە تەڵاقی دەكەوێ‌و پێی دەگوترێ: (البَینونة الصُّغری)، واتە: لێك جیابوونەوەی گچكە، چونكە پیاوەكە دەتوانێ بە گرێبەستێكی نوێ بیهێنێتەوە ژێر نیكاحی خۆی، هەروەها ئەگەر تەڵاقێكی دیكەشی دا، دووبارە ئەویش عیددەی بەسەرچووو نەیهێنایەوە دیسان بە لەیەك جیابووونەوەی گچكە لە یەك جیابوونەتەوە، بەڵام

تەڵاقێکی ماوەو دەتوانێ بە عەقدێکی نوێو نیکاحێکی تازە بیهێنێتەوە، بەڵام ئەگەر بۆ جاری سێیەم تەڵاقیدا، ئەوە ئەمجارە لە یەکترازانی گەورە (البَینونة الکُبری) ڕوویداوەو ناتوانن بگەڕێنەوە لای یەك، هەتا ژنەکە مێرد بە یەکێکی دیکە دەکاتو ئەویش وازی لێدێنێ، ئەوجار بۆی هەیە بچێتەوە لای مێردی پێشووی، وەك دوایی باسی دەکەین، ﴿ وَلَا يَحِلُّ لَهُنَّ أَن يَكْتُمْنَ مَا خَلَقَ ٱللَّهُ فِىٓ أَرْحَامِهِنَّ إِن كُنَّ يُؤْمِنَّ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْـَٔاخِرِ ﴾، وە ژنانی تەڵاقدراو بۆیان حەڵاڵ نیە ئەوەی کە خوا لە منداڵدانیاندا دروستی دەکات بیشارنەوە، ئەگەر بڕوایان بە خواو بە ڕۆژی دوایی هەیە، {واتە: ئەگەر حەملیان هەبوو نابێ بیشارنەوەو منداڵەکەیان لەبەر خۆیان بچوێنن، یان لە ڕقی مێردەکانیان بیشارنەوە، بۆ وێنە: کابرا هەر نەشزانێ کە ژنەکەی حەملی هەبووەو کۆرپەی لە زگدا بووە، یان منداڵەکەی ببێو هەر بە مێردەکەشی نەڵێ، ئەوە حەرامە ئەگەر بڕوایان بە خواو بە ڕۆژی دوایی هەبێت نابێ شتی وا بکەن} ﴿ وَبُعُولَتُهُنَّ أَحَقُّ بِرَدِّهِنَّ فِى ذَٰلِكَ إِنْ أَرَادُوٓا۟ إِصْلَـٰحًا ﴾، وە مێردەکانیان لە پێشترنو شایستەترن بەوە کە بیانگێڕنەوە لای خۆیان لەو ماوەیەدا، ئەگەر مەبەستیان چاکەکردن بێ، {واتە: مێردەکەی لە پێشترە بیگێڕێتەوە لای خۆی، هەتا دوای ئەوەی عیددەشی بەسەر دەچێ، هەرچەندە بۆی هەیە مێردێکی دیکە بکاتەوە، بەڵام مێردەکەی خۆی لە پێشترە مادام ژنەکەش ئامادەبێ، بەڵام بە مەرجێك مەبەستی پێ چاکەکردن بێ، نەك دووبارە ئافرەتەکە تووشی گرفتاریی بێتەوەو پیاوەکە مەبەستی بێ تووشی نارەحەتی بکات} ﴿ وَلَهُنَّ مِثْلُ ٱلَّذِى عَلَيْهِنَّ بِٱلْمَعْرُوفِ ﴾، وە بۆ ئافرەتان هەمان ماف هەیە کە هی پیاوانیان لەسەر شانە، بە شێوەیەکی بە چاك زانراو، واتە پیاو چ هەقێکی لەسەر ئافرەت هەیە ئافرەتیش هەمان هەقی لەسەر مێردی هەیە، جا ئەوە دوایی باسی دەکەین کە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس خوا لە خۆیو بابی ڕازی بێ دەڵێ: من بۆ ژنەکەی خۆم جوان دەکەم، وەك چۆن ئەو خۆی بۆ من جوان دەکات، وە خۆم بۆنخۆش دەکەم، وەك چۆن ئەو خۆی بۆ من بۆنخۆش دەکات،

ئـەو ئـەرك و مافانـەی ژن و مێردایـەتی هەموویان لـە بەرانبـەر یەكـن، ﴿ وَلِلرِّجَالِ عَلَيْهِنَّ دَرَجَةٌ ﴾، وە پیـاوان پلەیەكـیان بەسـەر ژنانـەوە هەیـە، ئـەو پلـەیە چـییە؟ دوایی باسی دەكەین، بەڵام زۆر لە توێژەرەوانی قورئـان دەڵێـن: بریتیـە لـە پلـەی سەرپەرشتیـكردنی خێزان، واتە: لە چوارچێوەی ماڵـدا، لـە خێـزاندا پیـاو دەبێ سـەرپەرشتی ماڵ و منداڵ و خێـزانی بكـات.

هەندێكـیش دەڵێن: ئـەو پلەیـە بریتیـە لـەوەی، كە پیـاو زیـاتر چـاك بێـت لـە ژنەكـەی و، دەبـێ ئـەو چاكەكارتربێ و، ئەگـەر ئـافرەت هەڵەیەكیـشی كـردو لێـی ببووری و لەگەڵی لەسـەرەخۆبێ، واتـە: پیـاوان پلـەی چاكەكـارییان بەسـەر ژنانـەوە هەیـە ﴿ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴾، وە خوا باڵادەسـتەو كـاربەجێشـە.

ئنجـا دێتـە سـەر باسـی ئـەو تەڵاقـەی كـە پێـی دەگـوترێ: تـەڵاقی ڕەجعیـی، ﴿ ٱلطَّلَٰقُ مَرَّتَانِ ﴾، تەڵاقـدان دوو كەڕەتــە، واتـە: ئـەو تەڵاقــەی كـە دروسـت بـێ كابــرا ژنەكــەی بێنێتــەوە ژێــر نیكــاحی خــۆی، كــەڕەتێك تەڵاقیــدا دەتوانــێ بیهێنێتەوەو، كەڕەتی دووەم تەڵاقیـدا دەتوانـێ بیهـێنێتەوە ﴿ فَإِمْسَاكٌۢ بِمَعْرُوفٍ أَوْ تَسْرِيحٌۢ بِإِحْسَٰنٍ ﴾، پاشـان یان دەبێ بە شـێوەیەكی پەسند لای خۆی بهێڵـتەوە، یـان بە شـێوەیەكی جوان و چاكەكارانە بەرەڵـدای بكـات و دەست لـێ بەربـدات، ئـەدی ئەگـەر ئـافرەت بیـەوێ لـە پیاوەكـەی دەربـازبێ، ئافرەتێـك گیـری خـواردوە بـە دەست پیاوێكی سەرخۆشی بێ هۆشی نوێژ نەكەری خـوا نەناسـەوە، یـان تەنبـەڵی قالب گرانی كاسبی نەكەری تەوەزەلـەوە، یـاخود بـەد ئـەخلاقی ڕەوشت نزمـەوە؟! چونكە وەك چۆن جاری وا هەیـە پیـاو بەدەسـتی ئافرەتـەوە گیـر دەخـوات، جـاری واش هـەیە ژن بە دەستی پیاوەوە گیـر دەخوات، ئەدی ئەگەر ژنـەكە گیـری خـوارد، چی بكـا؟ ئەوە پیـاو دەتوانـێ ژنەكەی تەڵاق بـدات، ئـەدی ئایـا شـەریعەت ڕێـی بـۆ ئافرەتیش دانەناوە؟ بـا، وەك خـوای كاربـەجێ فەرموویـەتی: ﴿ وَلَا يَحِلُّ لَكُمْ أَن تَأْخُذُوا۟ مِمَّآ ءَاتَيْتُمُوهُنَّ شَيْـًٔا إِلَّآ أَن يَخَافَآ أَلَّا يُقِيمَا حُدُودَ ٱللَّهِ ﴾، وە بۆتان نیـە ئـەوەی

کە داوتانە بە ئافرەتان هیچیان لێوەربگرنەوە، مەگەر بترسێن {واتە: ئەو ژن‌و پیاوە} بترسێن کە یاساکانی خواو سنوورەکانی خوا جێبەجێ نەکەن {واتە: پێکەوە نەسازێن} دەنا پیاو بۆی نیە لەخۆڕا بە ژنەکەی بڵێ: دەبێ مارەییەکەم بدەیەوە، یان ئەو دیارییانەی پێم داوی دەبێ بمدەیەوە، ﴿ فَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا يُقِيمَا حُدُودَ اللَّهِ ﴾، بەڵام ئەگەر ترستان {هەبوو ئەی مسوڵمانان! ئەی کۆمەڵگای مسوڵمان! ئەی دەوڵەتی ئیسلامیی}، کە ئەو ژن‌و مێردە یاساکانی خواو سنوورەکانی خوا لە بەینی خۆیاندا پیادە نەکەن‌و جێبەجێ نەکەن، ﴿ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِمَا فِيمَا افْتَدَتْ بِهِ ﴾، ئەوە گوناهیان ناگاتێ، لەوەدا کە ئەو ئافرەتە خۆی بکڕێتەوەو فیدیەیەك‌و قەرەبوویەك بدات، جا ئایا قەرەبووو فیدیە چییە؟ ئایا هەر ئەو مارەییەی کە لە مێردەکەی وەریگرتوە، بیداتەوە، یاخود بەشێك لە مارەییەکەی بداتەوە، یاخود دیارییەکی داوەتێ‌و مێردەکەی ڕازی دەبێ دەڵێ: فلانە دیارییم بدەوەو مارەییەکەم مەدەوە، چۆن مێردەکە ڕازی بێ بە کەمتر، یاخود هیچیشی لێ وەرنەگرێتەوە، جاری وا هەیە پیاو بە شەهامەتەو دەڵێ: من هیچم ناوێ، مادام بە من ڕازی نی بڕۆ خوا حافیزت بێ، کەواتە: مانای وا نیە ئافرەت لەسەری فەرزەو هەر دەبێ مارەییەکەی بداتەوە، یاخود دیارییەکانی بداتەوە، یاخود ئەو ماڵ‌و کەلوپەلانەی کە هی مێردەکەینی بیداتەوە، ئنجا دەفەرموێ: ﴿ تِلْكَ حُدُودُ اللَّهِ فَلَا تَعْتَدُوهَا ﴾، ئەوانە سنوورەکانی خوان مەیانبەزێنن ﴿ وَمَنْ يَتَعَدَّ حُدُودَ اللَّهِ فَأُولَئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ ﴾، وە هەر کەسێك سنوورەکانی خوا ببەزێنێ، ئا ئەوانەن ستەمکاران، ﴿ فَإِنْ طَلَّقَهَا فَلَا تَحِلُّ لَهُ مِنْ بَعْدُ حَتَّى تَنْكِحَ زَوْجًا غَيْرَهُ ﴾، جا ئەگەر (بۆ جاری سێیەم) پیاوەکە ژنەکەی تەڵاقدا، ئەوە ئەو ژنە بۆ ئەو پیاوە لەمەودوا حەڵاڵ نیە، هەتاکو ئەو ژنە مێردێکی دیکە دەکاتەوە، وە ئەو مێردە دەبێ لەگەڵیشی جووت بێ، وەك دوایی زیاتر ڕوونی دەکەینەوە، ﴿ فَإِنْ طَلَّقَهَا ﴾، جا ئەگەر (مێردی دووەم) تەڵاقیدا ﴿ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِمَا أَنْ يَتَرَاجَعَا ﴾، ئەو ژن‌و مێردە

گوناهیان ناگاتێ، ئەگەر بگەڕێنەوە لای یەك، {واتە: ژنەکە گوناهی ناگاتێ ئەگەر بگەڕێتەوە لای مێردی یەکەمی} ﴿إِن ظَنَّآ أَن يُقِيمَا حُدُودَ ٱللَّهِ﴾، بەمەرجێك بە مەزەنندەی خۆیان پێیان وابێ دەتوانن یاساکانی خواو سنوورەکانی خوا جێبەجێ بکەن، بەڵام ئەگەر پێیان وابێ، کە هەر پێکەوە ناسازێن، پێویست ناکات جاریکی دیکە یەکدی هەڵخەڵەتێنن و یەکدی تووشی سەرئێشە بکەن، ﴿وَتِلْكَ حُدُودُ ٱللَّهِ يُبَيِّنُهَا لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ﴾، ئا ئەوانەش سنوورەکانی خوان ڕوونیان دەکاتەوە بۆ کەسانێك کە بزانن، واتە: کەسانێ، کە بیانەوێ بزانن ئەوە خوای زانا سنوورەکانی حەڵاڵ و حەرامی خۆی لە هەموو ڕوویەکەوە بۆیان ڕوون دەکاتەوە، خوای بەخشەر لەو کەسانەمان بگێڕێ کە پابەند دەبن بە یاساکانی خواوەو سنوورەکانی خوا دەپارێزن و نایانبەزێنن.

## چەند مەسەلەیەکی گرنگ

**مەسەلەی یەکەم:** لە ڕابردوودا باسی (ئیلاء)مان کرد کە خوا دەفەرموێ: ﴿لِّلَّذِينَ يُؤْلُونَ مِن نِّسَآئِهِمْ تَرَبُّصُ أَرْبَعَةِ أَشْهُرٍ﴾، بۆ ئەو پیاوانەی کە سوێند لە ژنەکانیان دەخۆن کە نەچنە لایان، بۆیان هەیە چوار مانگ چاوەڕێ بکەن، لەوبارەوە پێویستە چەند شتێك ڕوون بکەینەوە:

**یەکەم:** پێناسەی (إيلاء)، زانایان بەم شێوەیە پێناسەی (إيلاء)یان کردووە: (الإِيلاء: هُوَ حَلِفُ الزَوْجِ عَلَى تَرْكِ وطءِ زَوجَتِهِ مُطْلَقَاً أَوْ مُقَيَّداً بِأَقلَّ مِنْ أَربَعَةِ أَشْهُرٍ أَوْ أَكْثر)، واتە: ئیلاء: بریتیە لە سوێند خواردنی مێرد لەوە، کە نەچێتە لای ژنەکەی (واتە: لەگەڵی جووت نەبێت) جا بەرەهایی سوێندی لێ بخوا کە هەرگیز لەگەڵی جووت نەبێت، یان بەندداری بکات بە کەمتر لە چوار مانگ، یان زیاتر لە چوار مانگ، یان ماوەی چوار مانگ، هەموو ئەو جۆرە سوێند خواردنانە لەڕووی شەرعییەوە پێیان دەگوترێ: (ئیلاء)، پێشتر باسمان کرد کە لەسەردەمی نەفامییدا مێرد بۆی هەبوو سوێند لە ژنی بخوات

كە هەرگیز نەچێتە لای: ساڵێك دوو ساڵ بەڵكو زیاتریش، خوای دادگەریش ئەوەی سنووردار كردو دیاری كرد كە لە چوار مانگ زیاتر ئەو ئافرەتە بۆی هەیە سكاڵا بكات لای قازیو، ئەویش ئەو پیاوە مولزەم دەكات، یان دەبێ بچێتەوە لای خێزانی، وەك حاڵەتی ئاسایی ژنو مێردایەتی، یان ئەوەتا قازی ئەو پیاوە ناچار دەكات دەستی لێ هەڵبگرێو ئەوە دەبێتە هەقی ئەو ئافرەتە، بەڵام لەكاتێكدا پیاوەكە بچێتەوە بۆ لای بەر لەوەی چوار مانگەكە تێپەڕن، یان بەر لەوەی ئەو ماوەیەی كە دیاری كراوە، بۆ وێنە: پیاوێك سوێند دەخوا لە خێزانی دەڵێ: هەتا مانگێك نایەمە لاتو سەرجێیت لەگەڵ ناكەم، ئەگەر دوای چەند ڕۆژێك بەر لەوەی ئەو مانگە تەواوبێ، بچێتەوە بۆ لای، ئەوە دەبێ كەفارەت بدات، واتە: كەفارەتی سوێند كە پێشتر باسمان كرد، كەفارەتی سوێند بریتیە لە یەكێك لە سێ شتان: یان نانی دە نەدار، یەكێ ژەمێكیان بداتێ، یان پۆشاكێك بۆ دە نەدار، یان ئازادكردنی كۆیلەیەك، كە ئێستا نیە، وە ئەگەر نەیتوانی هیچ كام لەوانە بكات، سێ ڕۆژان بەڕۆژوو دەبێ، جا لێرەدا زانایان دەڵێن: ئەگەر هاتو كابرا سوێندی نەخواردبوو، هەر گوتبووی: ناچمە لای هاوسەرم، زۆربەیان دەڵێن: ئەگەر سوێندیشی نەخواردبێ، هەر ئەوە كە گوتوویەتی: ناچێ بۆ لای خێزانی، بە سوێند لەقەڵەم دەدرێ.

هەندێكیشیان، دەڵێن: ئەگەر سوێندی نەخواردبێ، بە سوێند لەقەڵەم نادرێ، بەڵام گرنگ ئەوەیە دوای تێپەڕبوونی ئەو ماوەیەی كە دیاری كراوە، كە چوار مانگە، ئافرەتەكە بۆی هەیە لە هەقی خۆی بپێچێتەوە، وە ئەو پیاوە ناچار دەكرێ، یان ئەوەتا دەبێ لەگەڵ ژنەكەیدا بگەڕێتەوە حاڵەتی ئاسایی، یان ئەوەتا دەبێ دەستی لێ هەڵبگرێ.

وە هەندێك لە زانایان ئەم مەسەلەیە كە خوا ﷻ دەفەرموێ: (دوای چوار مانگ)، كردوویانە بە بەڵگەی ئەوە كە لەسەر پیاو فەرزە بە لای كەمەوە لە ماوەی چوار مانگ جارێك بچێتە لای خێزانی (لەگەڵی جووت بێت)، بەڵام من پێم وایە، وەك زانایانیش لەوبارەوە قسەیان كردوە كە ئەوە وانیە، بەڵكو بە ئەندازەی ئەوە كە ئەو ئافرەتە پێویستی جنیسیی تەواو دەبێ، ئەو پیاوە

مادام لە توانایدایە، لەسەری پێویستە کە بچێ بۆ لای، نەك تەنیا لە چوار مانگدا جارێك.

**مەسەلەی دووەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ وَإِنْ عَزَمُواْ ٱلطَّلَٰقَ فَإِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴾، ئەگەر ئەو پیاوانە کە سوێندیان لە خێزانیان خواردوە کە نەچنە لایان، بڕیاری تەڵاقیاندا، ئەوە بێگومان خوا بیسەری زانایە. واتە: دەبیستێ کە چییان گوتوە، وە زاناشە بەو نیازو مەبەستەی نێو دڵیان، جا ئەم ڕستە قورئانییە بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە ئەو قسەیەی هەندێك لە زانایان، بۆ وێنە: ئیمام مالیك ڕەحمەتی خوای لێبێ دەڵێ: هەرکەسێك سوێندی لە خێزانی خوارد نەچێ بۆ لای، وە چوار مانگ تێپەڕین، ئەوە بە تەڵاقێك دادەنرێ، مادام لە ماوەی ئەو چوار مانگەدا پەشێمان نەبێتەوەو نەچێتەوە بۆ لای خێزانیو کەفارەت نەدا، ڕاست نیەو سوێند خواردن لە خێزان، با ماوەکەشی تێپەڕێ، بە تەڵاقێك لەقەڵەم نادرێ، بە بەڵگەی ئەوە کە خوای کاربەجێ دەفەرموێ: ﴿ وَإِنْ عَزَمُواْ ٱلطَّلَٰقَ ﴾، کەواتە: تەڵاقدان پێویستی بە عەزیمەتو بە بڕیارێکی سەربەخۆ دەکات، بەڵام ئەوەندە هەیە ئافرەتەکە بۆی هەیە داوا لە مێردەکەی بکات، یان سکاڵای لەسەر قەید بکات، کە ئەگەر بێتو پەشێمان نەبێتەوە، ئەو کاتە خۆی لەژێر نیکاحی بەرێتە دەرێو خۆی لێ دەرباز بکات.

**مەسەلەی سێیەم:** باسی عیددەی ئافرەتانی تەڵاقدراو: ئافرەتانی تەڵاقدراو، واتە: ئافرەتانێك کە بۆ جاری یەکەم یاخود بۆ جاری دووەم تەڵاق دراون، چونکە ژن بە سێ جار تەڵاق دران لە پیاو جیادەبێتەوەو یەکجاریی لێك دەترازێن، جا لێرەدا کە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَٱلْمُطَلَّقَٰتُ يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ ثَلَٰثَةَ قُرُوٓءٍ ﴾، ئافرەتانی تەڵاقدراو چاوەڕێی خۆیان دەکەنو خۆیان مەرزەم دەکەن، هەتاکو سێ (قُرُوء) تێدەپەڕن، کە پێشتر باسمان کرد (قُرُوء) کۆی (قُرءَ) یان (قَرءَ)ە، ئەویش بەمانای حەیز دێو، بەمانای پاکیی دوای حەیزیش دێت، جا لێرەدا پێویستە بزانین کە: ئافرەتانی تەڵاقدراو پێنج جۆرن، واتە: پێنج جۆرە

ئافرەتمان هەیە کە تەڵاق دەدرێن بۆ جاری یەکەمو جاری دووەم :

١/ (آیسة، كَبيرة): ئافرەتێك کە بەتەمەنەو لە حەیز چۆتەوە، حەیزی نەماوە.

٢/ (صَغِيرَة): ئافرەتێکە کە کەم تەمەنەو جارێ نەکەوتۆتە حەیزەوە.

٣/ (حامل): ئافرەتێکە کە کۆرپەی لە منداڵدان دایە.

٤/ (غَير مدخول بها) ئافرەتێك کە مارە کراوەو نە پیرەو نە منداڵە، بەڵام جارێ مێردی نەچۆتە لای.

٥/ ئافرەتێك کە مێرددارەو مێردی چۆتە لای.

خوای زاناو شارەزا باسی عیددەی هەر کام لەو پێنج جۆرە ئافرەتەی کردوەو لە باسی جۆری یەکەمو دووەمو سێیەمدا دەفەرموێ:﴿ وَٱلَّٰٓـِٔي يَئِسۡنَ مِنَ ٱلۡمَحِيضِ مِن نِّسَآئِكُمۡ إِنِ ٱرۡتَبۡتُمۡ فَعِدَّتُهُنَّ ثَلَٰثَةُ أَشۡهُرٖ وَٱلَّٰٓـِٔي لَمۡ يَحِضۡنَۚ وَأُوْلَٰتُ ٱلۡأَحۡمَالِ أَجَلُهُنَّ أَن يَضَعۡنَ حَمۡلَهُنَّۚ ...﴿٤﴾ ﴾ الطلاق، واتە: ئافرەتانێك کە نائومێد بوون لە حەیز، یانی: لە حەیز چوونەتەوەو کەوتوونە تەمەنەوە، ﴿ إِنِ ٱرۡتَبۡتُمۡ ﴾، ئەگەر کەوتنە گومانەوە دەبێ عیددەیان چەند بێ؟ ﴿ فَعِدَّتُهُنَّ ثَلَٰثَةُ أَشۡهُرٖ ﴾، ئەوە عیددەیان سێ مانگە، واتە: دوای ئەوەی سێ مانگ لەو تەڵاقە تێدەپەڕێو دەگوزەرێ، ئەگەر بێتو مێردەکەی نەیهێنایەوە ژێر نیکاحی خۆی، لێی جیادەبێتەوە ﴿ وَٱلَّٰٓـِٔي لَمۡ يَحِضۡنَ ﴾، وە ئافرەتانێك کە نەکەوتوونەتە حەیزەوە، واتە: لەبەر ئەوەی کە تەمەنیان گچکەیە، ئەوانیش بە هەمان شێوە عیددەکەیان سێ مانگە ﴿ وَأُوْلَٰتُ ٱلۡأَحۡمَالِ أَجَلُهُنَّ أَن يَضَعۡنَ حَمۡلَهُنَّ ﴾، وە ئافرەتانی خاوەن حەمل، واتە: ئافرەتانی ئاوسو دووگیان کە کۆرپەیان لە منداڵداندا هەیە، عیددەکەیان بریتیە لە دانانی کۆرپەکانیان، ئەوە سێ جۆر.

بە نسبەت جۆری چوارەمەوە کە ئافرەتێکە مارە کراوەو نە زۆر کەوتۆتە

تەمەنەوە بە جۆرێك كە لە حەیز چووبێتەوەو نە بچووكیشە، بەڵام مێردی نەچۆتە لای‌و نەگوازراوەتەوە، خوای بێ هاوەڵ لەبارەیەوە دەفەرموێ: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا نَكَحْتُمُ ٱلْمُؤْمِنَـٰتِ ثُمَّ طَلَّقْتُمُوهُنَّ مِن قَبْلِ أَن تَمَسُّوهُنَّ فَمَا لَكُمْ عَلَيْهِنَّ مِنْ عِدَّةٍ تَعْتَدُّونَهَا ۖ فَمَتِّعُوهُنَّ وَسَرِّحُوهُنَّ سَرَاحًا جَمِيلًا ﴿٤٩﴾ ﴾ الأحزاب، واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! ئەگەر ئافرەتانی بڕوادارتان مارەكردن، دوایی تەڵاقتان دان بەر لەوەی دەستیان بگەیەننێ، {واتە: بەر لەوەی بیانگوازنەوەو لەگەڵیان جووتبن} ئەوە مافتان بەسەریانەوە نیە كە عیددە بشۆن {واتە: ئافرەتێك كە مێردی نەچۆتە لای یا مارەش كرابێت، ئەگەر مێردی دەستی لێ هەڵگرت، عیددەی لەسەر پێویست نیە}، دەجا سەرو دیارییان بدەنێ، وە بە شێوەیەكی جوان بەرهەڵدایان بكەن.

جۆری پێنجەم: كە ئافرەتێكە نە گچكەیەو نە لە حەیزیش چۆتەوەو نە كۆرپەی لە مندالْداندایەو، نە واشە كە (دخول)یشی پێنەكرابێ، بەڵكو ئافرەتێكە كە مێرددارەو گوازراویشەتەوە، ئا ئەوەیان عیددەكەی بریتیە لە سێ حەیز یاخود سێ پاكیی دوای حەیز چونكە وەك باسمان كرد (قُرُوٓءٍ) كۆی (قُرءَ) یان (قَرءَ)ە، ئەمیش لە زمانی عەرەبیدا بەمانای حەیز دێ، واتە: ئەو خوێنەی كە ئافرەت بە هۆی عادەتی مانگانەوە لێی دێ، وە بەمانای پاكیی دوای حەیزیش دێت.

**مەسەلەی چوارەم:** دەربارەی ئەو ڕستە قورئانییە، كە دەفەرموێ: ﴿ وَلَهُنَّ مِثْلُ ٱلَّذِى عَلَيْهِنَّ بِٱلْمَعْرُوفِ ﴾، وە بۆ ژنان هەیە لەسەر پیاوان، بە بارتەقای ئەوە كە لەسەرشانیانە بەرانبەر بە پیاوان، واتە: ژن چ ئەركێكی لەسەرشانە، بەرانبەر بە پیاو، هەمان مافی هەیەو لە بەرانبەر ئەو ئەركەدا ئەویش هەمان مافی هەیە لەسەر پیاو، بەڵام بە شێوەیەكی پەسندو بە چاك زانراو ﴿ وَلِلرِّجَالِ عَلَيْهِنَّ دَرَجَةٌ ﴾، بەڵام پیاوان پلەیەكیان بەسەریانەوە هەیە، لەوبارەوە

تویێژەرەوانی قورئـان زۆر قسەیان کـردوە، کـە هـەر مافێـك پیـاو لەسـەر ژن هەیەتی، ژنیش لـە بەرانبـەردا مافێـکی بـە هـەمان شێوەی لەسـەر پیـاو هەیـە، عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس وەك (القُرطُبي) لە تەفسیـرەکەی خۆیدا هێناویەتی ئـاوا تەفسیـری ئـەم ئایەتـەی کـردوە، دەڵێـت: ((أي لَهُـنَّ مِن حُسْنِ الصُحبة والعشرة بالمَعروف على أزواجِهِنَّ مثل الذي علَيهِنَّ مِنَ الطاعةِ فيما أوجَبَهُ عَلَيهِنَّ لأزواجِهِنَّ))[1]، واتـە: ژنـان مافیـان هـەیە لەسـەر پیاوان کـە جـوان مامـەڵیـان لەگەڵدا بکەن و جوان ژن و مێردایەتییان لەگەڵدا بکەن، هەروەك چۆن بۆ پیاوان لەسەر ژنـان هەیە، کە لە سنووری شەرعـدا بـە قسەیان بکـەن (لـە چوارچێوەی خێزانـدا) گوێـڕایەڵ بن بۆ مێردەکانیـان، ئنجا عەبدوڵـڵای کوڕی عەبباس خـوا لە خۆیو بـابی ڕازی بێ، لەوبارەوە گوتوویـەتی: ((إنـي لأَتزيـن لإمرأتـي كَما تَتَزينُ لِي))[2]، واتە: من خۆم بۆ هاوسەری خۆم جوان دەکەمو خۆم بۆنخۆش دەکەم وەك چۆن ئەو خۆی بۆم جوان دەکاتو بۆنخۆش دەکـات، گوتوویـەتی: چونکـە خـوا وایفـەرمووە: ﴿ وَلَهُنَّ مِثْلُ ٱلَّذِى عَلَيْهِنَّ بِٱلْمَعْرُوفِ ﴾، لێرەدا دەبینین کـە قورئـان زۆر داکۆکیی لەسەر مـافی ئـافرەت دەکـات، وەك لـە دەرسی ڕابردووش باسمان کرد، بەڵام بۆ کەسانێك کە پابەندبن بە شەریعەتەوە، هاوەڵانی بەرێز چونکە چاك لە دین تێگەیشتبوون، وە باش پێوەی پابەندبوون، ئەوەتا عەبدوڵـڵای کوڕی عـەبباس زانیویـەتی بـەپێی ئـەم ئایەتـە، تەنانـەت لـە شتێکی گچکەی وەك خـۆ جوانـکردنو خـۆ بـۆن خۆشکردنیشدا، پیاو لەسەری پێویستە وەك چۆن پێی خۆشە خێزانەکەی خۆی بۆ جوان بکـاتو خـۆی بۆ بۆن خۆش بکات، ئەویش لەسەری پێویستە بە هەمان شێوە بۆ خێزانی بکات، چونکە ئەگەر تۆ ئەو مافەت لەسەر خێزانت هەیە، ئەویش بە هەمان شێوە ئەو مافەی لەسەر تۆ هەیە.

---

١) (جامع لأحكام القرآن)، ج: (٣)، ص: (١٠٨) .

٢) هەمان سەرچاوەو بەرگو لاپەڕە .

﴿ وَلِلرِّجَالِ عَلَيْهِنَّ دَرَجَةٌ ﴾، بۆ پیاوان پلەیەك هەیە لەسەر ئافرەتان، ئەمە توێژەرەوانی قورئان بە چەند شێوەیەك واتایان لێكداوەتەوە، زۆربەیان گوتوویانە: مەبەست لەو پلەیە پلەی قیوامەیە (سەرپەرشتیاریی)، كە ژن لە ماڵدا پێویستە بە قسەی مێردی بكاتو پیاو سەرپەرشتی ژنو منداڵەكانی بكات، ئەو پلەیە مەبەست پێی سەرپەرشتییو مشوور لێ خواردنە، كە لەڕاستیدا ئەو پلەیە بەرلەوەی تەشریف بێ تەكلیفەو، بەرلەوەی پلەو پایە بێ، ئەركو بەرپرسیارییە.

بەڵام (الطَبَري)[1] لە تەفسیرەكەی خۆیدا، بە جۆرێكی دی مانای لێكداوەتەوەو دەڵێ: واتە: دەبێ پیاوان هەوڵبدەن چاكتربن بۆ ژنەكانیان لە ژنەكانیان بۆ مێردەكانیان، واتە: پیاو دەبێ هەوڵبدات پلەو پایەی لەسەر خێزانییەوە بێ لەڕووی چاكییەوەوە، ئەگەر ئافرەتەكە كەمتەرخەمیەكی هەبێو جارجار هەندێ ئەركو مافی مێردەكەشی فەرامۆش بكات، با ئەو لەو چاكتربێو هیچ ئەركو مافی ژنەكەی فەرامۆش نەكاتو چاوپۆشیی لێبكات، ئنجا بەڕاستی ئەو ئایەتەی سوورەتی (النساء) پاڵپشتی ئەم ڕایە دەكات، كە خوای بەخشەر دەفەرموێ: ﴿ ...وَعَاشِرُوهُنَّ بِٱلْمَعْرُوفِ ۚ فَإِن كَرِهْتُمُوهُنَّ فَعَسَىٰٓ أَن تَكْرَهُوا۟ شَيْـًٔا وَيَجْعَلَ ٱللَّهُ فِيهِ خَيْرًا كَثِيرًا ﴿١٩﴾ ﴾، بە پیاوان دەفەرموێ: وە لەگەڵ خێزانەكانتان باش مامەڵە بكەن، وە ئەگەر ڕقتان لێیان بۆوە، نزیكەو جاری وا هەیە ڕقتان لە شتێك بێ، بەڵام خوا خێرێكی زۆری تێدا دابنێ.

(سَیْد قُطب)[2]یش ڕەحمەتی خوای لێبێ دەڵێ: مەبەست لەو پلەیە ئەوەیە، كە پیاو لە ماوەی عیددەدا سەرپشكە لە گێڕانەوەی، یان

---

١) (جامع البيان)، ج: (٢)، ص: (٥١٢) ، كە گوتویەتی:

(وأولى هذه الأقوال بتأويل الآية ماقاله: (ابن عباس) وهو أنَّ الدرجة التي ذكر الله تعالى ذكره في هذا الوضع: الصَّفْحُ من الرَّجُلِ لامرأته عن بعض الواجب له عليها وإغضاؤه لها عنه وأداءُ كل الواجب لها عليه .

٢) (في ظلال القرآن)، ج: (١)، ص: (٢٤٦، ٢٤٧) .

نەگێڕانەوەی ژنەکەیداو لەو مەسەلەیەدا، پلەی بەسەر ژندا هەیە، نەك بە ڕەهایی پیاو پلەی بەسەر ژنەوە هەبێ‌و، بە ڕەهایی پیاو لە ئافرەت گەورەتر بێت! بەڵکو مەبەست ئەوەیە کە لەو مەسەلەیەدا مێردەکان مافێکیان هەیە کە ژنەکان نیانە، ئەویش بڕیاردانە لەسەر درێژەپێدانی ژیانی هاوسەریی، یان ڕاگرتن‌و هەڵوەشاندنەوەی.

**مەسەلەی پێنجەم:** ﴿ ٱلطَّلَٰقُ مَرَّتَانِۖ فَإِمۡسَاكُۢ بِمَعۡرُوفٍ أَوۡ تَسۡرِيحُۢ بِإِحۡسَٰنٍۗ ﴾، مەبەست لەو تەڵاقە کە دەفەرموێ: تەڵاق دوو کەڕەتە، کە لێرەدا دەبێ وریابین نەیفەرمووە: (الطَّلاَقُ طَلْقَتَانِ) بەڵکو فەرموویەتی: (الطَّلاَقُ مرَّتَانِ) تەڵاق دوو کەڕەتە، دوو جارە، دوو قۆناغە، چ جۆرە تەڵاقێك، خۆ تەڵاق سێ دانەیە؟! واتە: تەڵاقی (رَجْعي) یانی: ئەو تەڵاقدانەی کە پیاو دەتوانێ ژنەکەی بهێنێتەوە لای خۆی، ئەوە دوو کەڕەتە، کە بوو بە سێ کەڕەت تازە ئەو ئافرەتە یەکجاریی لەو پیاوە قەدەغە دەبێ‌و ناتوانێ بچێتەوە بۆ لای، کەواتە: کە دەفەرموێ: ﴿ ٱلطَّلَٰقُ مَرَّتَانِۖ ﴾، واتە: (تەڵاقی ڕەجعیی)، یانی: ئەو تەڵاقەی کە بواری تێدا ماوە پیاو خێزانەکەی بێنێتەوە بۆ لای خۆی، جارێك تەڵاقی دەدا ئەگەر عیددەی بەسەرچوو، واتە: سێ حەیز، یان سێ پاکیی، یان سێ مانگ تێپەڕبوون، ئەوە ئەو ئافرەتە لەو پیاوە جیادەبێتەوە، بەڵام ئەوە جیابوونەوەی گچکەی پێ دەڵێن: (البَيْنُونَة الصُغْرَى)، بۆچی جیابوونەوەی گچەکەیە؟ چونکە پیاوەکە دەتوانێ ژنەکەی بێنێتەوە لای خۆی، بەڵام بە گرێبەستێکی تازەو بە مارەییەکی تازە (بعَقْدٍ جَدِيد، وَمَهْرٍ جَدِيد) واتە: دەبێ دووبارە مارەی بکاتەوەو مارەیی بداتێ، دیارە ئەوە ئەگەر لێی بگەڕێ عیددەی بەسەرچێ، بەڵام پێش ئەوەی عیددەی بەسەر بچێ، دەتوانێ بیهێنێتەوەو مارەکردنەوەی ناوێت، بەڵام تەڵاقێکی کەوتوەو لە سێ تەڵاقەکان یەکێکیان ڕۆیشتوە، وە بۆ جاری دووەمیش بە هەمان شێوە، پیاو بۆی هەیە خێزانەکەی بهێنێتەوە لای خۆی بەمەرجێ ئەو ئافرەتە ڕازی بێ بچێتەوە لای، چونکە تازە لێی جیابۆتەوە، بەڵام پێش ئەوەی عیددەی بەسەربچێ ئەوە ژنەکە دیارە

وەك گوتم هەر لەژێر نیکاحی ئەو پیاوە دایە، بەس ئەگەر نەیهێنایەوە تاکو عیددەی بەسەر دەچێ، ئەوە تەلاقی دووەمیشی دەکەوێ، بەلام ئەگەر دوو تەلاقی کەوتوون، یەکێکی هەر ماوەو دوو قۆناغ لە جیابوونەوە تێپەڕیون و قۆناغی کۆتایی ماوە، هەڵبەتە ئەوەش حیکمەتی زۆری تێدایە کە خوای پەروەردگار لێکترازانی ژن و مێردی کردوە بە سێ قۆناغ، بۆ ئەوەی یەکجار نەبێ و کابرا تووڕە دەبێ تەلاقێکی دەدا، بە یەکجاریی لەیەك بترازێن! خوای کاربەجێ کردوویەتی بە سێ قۆناغ، وە بەڕاستیش بەو سێ قۆناغە ئەو ژن و مێردە لە یەکدی حاڵی دەبن، کە ئایا دەتوانن پێکەوە بژین یان نا ؟ تەماشا بکەن ئیسلام زۆر گرنگی بە خێزان داوەو زۆر گرنگی بە پەیوەندیی نێوان ژن و مێرد داوەو، ئەوەش هەر لەبەر خۆیان نیە، بەڵکو لەبەر منداڵیانە، لەبەر خزمیانە، لەبەر لایەنی کۆمەڵایەتییە... لەبەر کۆمەڵێك هۆکارە.

ئنجا خوای کاربەجێ باسی هەڵوێستی شەرعییانەی ڕاست و دروستی پیاو دەکات چ لە پێش تەلاقی یەکەمدا چ دوای ئەوەو، چ لە پێش تەلاقی دووەمداو چ لە دوای و دەفەرموێ: ﴿ فَإِمۡسَاكُۢ بِمَعۡرُوفٍ ﴾، ئەویش ئەوەیە، کە یان بە چاکیی بیگرێتە خۆی و لەلای خۆی بیهێڵێتەوە، بە شێوەیەکی پەسند ﴿ أَوۡ تَسۡرِيحُۢ بِإِحۡسَٰنٖ ﴾، یان ئەوەتا بە شێوەیەکی جوان بەرهەڵدای بکات و وازی لێبێنێ، کە ئەمەیان دەبێتە قۆناغی سێیەم، کە خوا دوایی باسی دەکات، واتە: پێش ئەوەی عیددەی بەسەر بچێ دەتوانێ بە شێوەیەکی چاکەکارانە لای خۆی بیهێڵێتەوە، کە دیارە مەبەست لێرەدا دوای تەلاقی یەکەم، یان دووەمە، ﴿ فَإِمۡسَاكُۢ بِمَعۡرُوفٍ ﴾، بەلام ئەگەر دڵنیابوو لەوەی پێکەوە نایانکرێ و ناگونجێن: ﴿ أَوۡ تَسۡرِيحُۢ بِإِحۡسَٰنٖ ﴾، یان با لێیگەڕێ و بە شێوەیەکی چاك بەرهەڵدای بکات و نەیگێڕێتەوە لای خۆی، کە ئەوە پێی دەگوترێ: لێك جیابوونەوەی گچکە (البَيْنُونَة الصُغرى) کە ئەگەر دوای تەلاقدانی یەکەم بێ پێی دەگوترێ: جیابوونەوەی گچکەی یەکەم (البَيْنُونَة الصُغرى الأولى)، وە

ئەگەر دوای تەڵاقدانی دووەم بێ، پێی دەگوترێ: جیابوونەوەی گچکەی دووەم (البَيْنُونَة الصُغرى الثانية)، وە لە هەردووك حاڵەت دەتوانێ بە مارەكردنێكی تازە بیهێنێتەوە لای خۆی، دیارە هەندێ لە توێژەرەوانی قورئان گوتوویانە: ﴿أَوْ تَسْرِيحٌۢ بِإِحْسَٰنٍ﴾، مەبەست پێی تەڵاقی سێیەمە، بەڵام من پێم وایە، ئەوە وانیە، بەڵكو مەبەست ئەوەیە كە بە شێوەیەكی جوان بەرهەڵدای بكات ئەویش بەو شێوەیە كە لێبگەڕێ عیددەی بەسەربچێ! لێرەدا مەبەست ئەوەیە بەڵام كە عیددەشی بەسەرچوو، دوو تەڵاق یان تەڵاقێكی ماوەو، ئەگەر ئافرەتەكە ڕازی بێ دەتوانێ بە نیكاحێكی تازە بچێتەوە لای مێردەكەی، بەڵام باسی تەڵاقی سێیەم لە ئایەتی ژمارە: (٢٣٠)دا دێ كە لە مەسەلەی نۆیەمدا باسی دەكەین.

**مەسەلەی شەشەم:** مەسەلەی تەڵاقی سێ بەسێ كە لەنێو زانایاندا مشتومڕێكی زۆری لەسەرە، دیارە لە كوردەواریی خۆماندا زۆربەی مامۆستایان قەناعەتیان وایە سێ تەڵاق بە یەكجار دەكەون، بەڵام لەوبارەوە زانایان بەگشتی سێ ڕایان هەن:

**یەكەم/** هەندێ لە زانایان بە تایبەت زانایانی شیعە مەزهەب، وە هەندێ لە زانایانی دیكەش دەڵێن: تەڵاقی سێ بەسێ هیچیان ناكەون، دەڵێن: چونكە ئەوە تەڵاقێكی بیدعی یەو خوای زاناو شارەزا داینەناوە كە پیاو سێ تەڵاق لە یەك كاتدا بخواو، هەرسێ قۆناغەكەی بە یەك قۆناغ تێپەڕێنێ، لەبەر ئەوە شتێكی شەرعیی نیەو هیچیان ناكەون.

**دووەم/** هەندێكی دیكە دەڵێن: یەك تەڵاقی دەكەوێ، ئەگەر كابرا بشڵێ سێ تەڵاقی بكەوێ لە دە مەجلیسیش دابێ، مادام لە یەك كاتدابێ، دووبارەشی بكاتەوە هەر یەكێكیان دەكەوێ، ئەوەش ڕای ژمارەیەك لە زانایانی دیارە، هەم لە سەردەمی هاوەڵانی بەڕێزداو هەم هی تابعین و دواییش، وە پیاوانی وەك: (إبن تيمية وإبن القيم وإبن كثير والشوكاني)و زانایانی هاوچەرخیش، زۆریان ئەو ڕایەیان وەرگرتوە، كە تەڵاقی سێ بەسێ تەنیا یەكێكیان دەكەوێ.

**سێیەم/** زۆربەی زانایانی چوار مەزهەبەکان: (حەنەفیی، مالیکیی، شافیعیی، حەنبەلیی)، ڕایان وایە کە هەر سێکیان دەکەون.

وە من وای بۆ دەچم کە ڕای دووەم لە هەموویان بەهێزترەو، دەتوانین چەند بەلگەیەکیش لەوبارەوە بهێنینەوە:

بەڵگەی یەکەم: ئەوەیە کە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ ٱلطَّلَٰقُ مَرَّتَانِ ﴾، نەیفەرمووە: (الطَّلاَقُ طَلْقَتَان) تەلاق کە وەك باسمان کرد، واتە: بەرهەلّداکردن و ئازادکردنی مێرد بۆ ژنەکەی، خوا دەفەرموێ: دوو کەڕەتە، واتە: تەلاقێك کە بگونجێ ئافرەت دووبارە بێتەوە لای مێردەکەی دوو کەڕەتە، نەیفەرمووە: دوو دانە (طَلْقَة)یە، یان: دوو وشەیە، کەواتە: دەبێ مێرد بە دوو جار و بە دوو قۆناغ ژنەکەی واز لێبێنێ و دەستی لێبەردا.

ئنجا ئەگەر کەسێك بڵێ: هەزار جار (سُبحَانَ الله)، یان: هەزار جار (لاَ إِلَه إلاَّ الله)، بێگومان هەر بە یەکجاریی بۆ حیساب دەکرێ، چونکە یەکجار وایگوتوە، ئەوەتا پێغەمبەریش ﷺ دەفەرموێ[1]: هەر کەسێ لەدوای هەر نوێژێکی فەرز سی و سێ جار (سُبحَانَ الله) بکات و سی و سێ جار (الحَمْدُ لله) بکات و سی و سێ جار (اللهُ أَكبَر) بکات، وە جاری سەدەمین بڵێ: (لا اله الاّ الله وحدة لا شريك له، له الملك و له الحمد، وهو على كل شيء قدير)، گوناهەکانی ئەگەر هێندەی کەفی دەریاش بن دەبووررێن، یانی: دەبێ (٣٣) جاران بڵێ: (سُبحَانَ الله، سُبحَانَ الله، سُبحَانَ الله، ... هتد،) ئنجا دەڵێی: سی و سێ جار (سُبحَانَ الله)ی گوتوەو سی و سێ جار (الحَمْدُ لله)ی گوتوەو سی و سێ جار (اللهُ أكبَر)ی گوتوە، بەلاّم ئەگەر یەکجار بڵێ: سی و سێ جار (سُبحَانَ الله) هەر بە یەکجار بۆی حیسابە! کەواتە: کەسێکی دیکە کە دەڵێ: سێ تەلاقی ژنەکەی بکەوێ، هەزار تەلاقی بکەوێ، عەشایەری خۆمان هەیە گوتوویەتی: بە پڕی ئەم ژوورە تەلاقی بکەوێ ! کاکە تۆ سێ تەلاقت

---

١) بڕوانە: (صحيح مسلم)، (٥٩٦، ٥٩٧) .

بەدەستە، پڕی ژووری چی !! یان ئەو خانووە چەند داری تێدایە، یان فڵان کەس چەند موو بەسەرییەوە، هەیە، ئەوەندە تەڵاقی بکەوێ! ئەوە هەر قسەیەکی نەفامانەیەو هیچی دیکە، گرنگ ئەوەیە بە سێ قۆناغ ژن لە مێردی جیادەبێتەوە.

ئنجا ئەگەر تەماشا بکەین خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ ٱلطَّلَٰقُ مَرَّتَانِ ﴾، وە هەر لە قورئاندا خوای زاناوشارەزا دەفەرموێ: ﴿ ... سَنُعَذِّبُهُم مَّرَّتَيۡنِ ثُمَّ يُرَدُّونَ إِلَىٰ عَذَابٍ عَظِيمٖ ﴿١٠١﴾ ﴾ التوبة، کە مەبەست پێ ئازاردانی کافرەکانە لە دنیادا بە بەڵاو، وە لە دوارۆژیشدا بە دۆزەخ، وە هەر لە سووڕەتی (التوبة)دا دەربارەی مونافیقەکان دەفەرموێ: ﴿ أَوَلَا يَرَوۡنَ أَنَّهُمۡ يُفۡتَنُونَ فِي كُلِّ عَامٖ مَّرَّةً أَوۡ مَرَّتَيۡنِ ثُمَّ لَا يَتُوبُونَ وَلَا هُمۡ يَذَّكَّرُونَ ﴿١٢٦﴾ ﴾، واتە: ئایا نابینن کە هەموو ساڵێ جارێك یان دوو جار، تاقی دەکرێنەوە، پاشان ناگەڕێنەوەو پەندیش وەرناگرن! کەواتە: ئەگەر جارێك بێت، دیارە لە ماوەیەکدایەو، ئەگەر دوو جاربێ لە دوو ماوە دایەو ئەگەر سێ جار بێ، لە سێ ماوە دایەو بە سێ قۆناغە.

بەڵگەی دووەم: ئەم فەرموودەیە {(عَنِ ابْنِ عَبّاسٍ، قَالَ: كَانَ الطَّلاَقُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللهِ ﷺ و أبِي بَكْرٍ وسَنَتَيْنِ مِنْ خِلافَةِ عُمَرَ، طَلاَقُ الثَّلاثِ واحِدَةً، فَقَالَ عُمَرُ بْنُ الخَطّابِ: إنَّ النّاسَ قَدِ استَعْجَلُوا في أَمْرٍ قَدْ كَانَتْ لَهُم فيهِ أناةٌ، فَلَوْ أمْضَيْنَاهُ عَلَيهِمْ، فَأَمْضَاهُ عَلَيْهِمْ) (رَوَاهُ مُسلم برقم: (٣٦٥٨) واللَّفْظُ لَهُ، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٢٢٠٠)، وَالنَّسَائِيُّ برقم: (٣٤٠٦)}، واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس دەڵێ: تەڵاقدان لە سەردەمی پێغەمبەر ﷺ و ئەبو بەکر خوا لێی ڕازی بێ، وە دوو ساڵیش لە جێنشینایەتی عومەر خوا لێی ڕازی بێ وابوو، کەسێك سێ تەڵاقی دابایە، تەنیا یەکێکیان دەکەوت، عومەر خوا لێی ڕازی بێ گوتی: خەڵك لە شتێکدا پەلەیان کرد، کە دەیانتوانی پەلەی تێدا نەکەن، با بۆیان بڕیار بدەین {مادام بۆ خۆیان

پێیان خۆشە سێ تەڵاقیان بە یەکجار بدەن‌و هەر سێ قۆناغی بکەنە یەك قۆناغ، با وەك سزادانێك بەسەریاندا بسەپێنین﴾ وە ئەو جۆرە سزایەی بەسەردا سەپاندن.

کەواتە: لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ وە لە سەردەمی ئەبو بەکر، وە دووساڵیش لە سەردەمی عومەر، ئەگەر کەسێك سێ تەڵاقی خێزانەکەی دابایە یەکێکیان دەکەوت، ئنجا ئەگەر ڕۆژگاری پێغەمبەر ﷺ واتە: سوننەتی پێغەمبەر بێنین، قسەی هاوەڵان جا چ هی ئەبو بەکرە، چ هی عومەرە خوا لێیان ڕازی بێ، کە پێکەوە دەخرێنە تەرازوویەکەوە بێگومان قسەی هاوەڵان دەچێتە ئاسمانێ، قسە قسەی پێغەمبەرە ﷺ، ئەوە یەك، چ جای ڕۆژگاری خیلافەتی ئەبو بەکرو دوو ساڵیش لە ڕۆژگاری خیلافەتی عومەریشی بخرێتە پاڵ! پاشان عومەریش خوا لێی ڕازی بێ ئەوە وەك سزادانێك بووەو لە سنووری دەسەڵاتی سیاسەتی شەرعییدا لەلایەن حوکمڕانەوە، ئەو سزایەی داون، ئنجا بێگومان دوای خۆی سزایەکەی بەردەوام نابێت، بەڵکو دەچێتەوە سەر ئەسڵەکەی خۆی‌و پێغەمبەر ﷺ چۆنی بڕیار داوە دەبێ وابێ.

**بەڵگەی سێیەم:** حیکمەتی دانانی سێ جار تەڵاقدان: واتە: تەڵاقدان بە سێ قۆناغ، ئەوەیە کە ئەو ژن‌و مێردە مۆڵەتیان هەبێ، بۆ قۆناغی یەکەم کە تەڵاقیدا دەرفەتی هەیەو دوو قۆناغی بەدەستەوە ماون، بەڵام ئەگەر بێت‌و هەر سێ قۆناغەکان بکرێنە یەك قۆناغ، ئەو حیکمەتە تێك دەچێ‌و نامێنێ.

**بەڵگەی چوارەم:** {عَنْ مَحْمُودَ بْنَ لَبِيدٍ، قَالَ: أُخْبِرَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: عَنْ رَجُلٍ طَلَّقَ امْرَأَتَهُ ثَلاثَ تَطْلِيقَاتٍ جَمِيعًا، فَقَامَ غَضْبَانًا ثُمَّ قَالَ: (أَيُلْعَبُ بِكِتَابِ اللَّهِ وَأَنَا بَيْنَ أَظْهُرِكُمْ؟) حَتَّى قَامَ رَجُلٌ وَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَلا أَقْتُلُهُ؟) (رَوَاهُ النَّسَائِيُّ بِرقم: (٣٤٠١)}، واتە: مەحموودی کوڕی لوبەید دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ هەواڵی پێدرا، پیاوێك خێزانەکەی خۆی تەڵاق داوە، هەر سێ تەڵاقەکەی بە یەکجار داون، پێغەمبەریش ﷺ هەستا توڕەبووو فەرمووی: چۆن دەبێت کاتێك من لەنێوتاندام گاڵتە بە کتێبی خوا

بکریٚ؟ {واتە: خوا فەرموویەتی: ﴿ ٱلطَّلَٰقُ مَرَّتَانِ ﴾، چۆن دەبێت تۆ هەر سێ قۆناغەکە بکەی بە یەك؟} هەتا پیاوێك هەڵساو گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا بیکوژم؟ هەڵبەتە لێرەدا گاڵتە بە کتێبی خوا کردن بەو مانایەیە کە خوا داینـاوە: تەڵاق و لێك جیابوونەوەی ژن و مێرد بە سێ قۆنـاغ بێ، ئنجا ئەگەر یەکێك بیەوێ بیکات بە یەك قۆنـاغ، دیارە گاڵـتە دەکات، دیارە ڕەواش نیە ئەو گاڵـتە پێکردنە بکرێتە یاسایەك و مسوڵمانانی پێوە مولـزەم بکرێـن.

بەڵگەی پێنجـەم: حەدیسێکی دیکەی پێغەمبەر ﷺ هەیـە کـە (الدار قطني) هێنـاویەتی و (إبن كثيـر) بە (صحيح)ی دانـاوە، دەفـەرموێ[1]: {(إِنَّ اللّٰهَ حَدَّ حُدُودًا فَلا تَعتَدُوهَا، وَفَرَضَ فَرَائِضَ فَلا تُضَيِّعُوهَا، وَحَرَّمَ مَحَارِمَ فَلا تَنتَهِكُوهَا، وَسَكَتَ عَنْ أَشيَاءَ رَحمَةً بِكُمْ مِن غَيرِ نِسيانٍ فَلاَ تَسأَلُوا عَنْهَا)}، واتە: بێگومان خوا چەند سنوورێکی دیاری کردووە مەیانبەزێنن، وە چـەند شتێکی فـەرزکردووە مـەیان فـەوتێنن، وە چـەند شـتێکی قەدەغـە کردووە، توخنیـان مەکەون، وە لە هەندێ شت بێدەنگ بووە لەڕووی بەزەیی پێداهاتنەوەتـان، بێ ئەوەی کە لە بیری چووبێ، لێیـان مەپرسن.

جا لێرەدا دەتوانین بڵێین: ئەگەر گریمان واشبێ ئەو سێ تەڵاقە، خوای زانـا لێی بێدەنـگ بووبێ، مـادام ئـەو لـێی بێدەنـگ بـووە، تـۆش بـۆت نیـە لـەخۆڕا بڵێی: وانیـە، ئنجا لە ڕاستیدا وێڕای ئـەو بەڵگانـە، زانایـان شتی دیکەشیان بـە بەڵگـە هێنـاوەتـەوە لەسـەر ئـەوە کـە کەسـێك ژنەکـەی تەڵاقـدا هـەر سـێ تەڵاقەکـەی بە جـارێك هەر یەکیان دەکەوێ، وە منیش بۆخۆم ئەو ڕایـەم پـێ ڕاستو بەجێیەو، ئەوەش لەگەڵ حیکمەتی شەریعەتـدا دەگونجێ، وە بـە پـێی قسەی عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسـیش خـوا لـێیـان ڕازی بێ، کـە (مُسلم وَأَبُو دَاوُدَ وَالنَّسَائِيُّ) لێیـان گێڕاوەتـەوە، لـە سـەردەمی پێغەمبـەری خـواش ﷺدا هـەر وابـووە.

---

١) (المصباح المنير...)، ص: (١٦٧).

**مەسەلەی حەوتەم:** دەربارەی (خُلْع) واتە: لە خۆ دارنینی ژن بۆ مێردەکەی: ئەویش لە ڕابردوودا ئاماژەمان پێدا کە وەك چۆن پیاو تەڵاقی بەدەستە، ئافرەتیش (خُلْع)ی بەدەستە، واتە: ئەگەر پیاو بۆی هەبێ دەستبەرداری خێزانەکەی بێ بە سێ قۆناغ، ئەوا ئافرەتیش بۆی هەیە بە یەك قۆناغ مێردەکەی لە ملی خۆی دابڕنێ! شەرعزانان لەپێناسەی (خُلْع)دا ئاوایان گوتوە: (الخُلْع: هُوَ أَن يُطلِّقَ الرَّجلُ زَوجَتَهُ عَلَى فِديةٍ مِنهَا)، واتە: (خُلْع)، بریتیە لەوەی کە پیاو دەستبەرداری خێزانەکەی بێت لە بەرانبەری قەرەبوویەکدا لە ئافرەتەکەوە، لەوبارەوە چەند فەرموودەیەك هەن، بۆ وێنە: {(رَوَى البُخَارِي وَالنَّسَائِيُّ عَنْ ابنِ عَبَّاسٍ أنَّ امْرَأةَ ثَابتِ بنِ قَيْسِ بنِ شَمَاسٍ أتَتِ النَّبِيَّ ﷺ فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللهِ! ثَابتُ بنُ قَيْسٍ، أَمَا إِنِي مَا أعِيبُ عَلَيهِ في خُلُقٍ وَلا دِينٍ، ولَكِنِي أَكْرَهُ الكُفْرَ في الإسلام! فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: أَتَرُدِّينَ عَلَيْهِ حَدِيقَتَهُ؟ قَالَتْ: نَعَمْ، قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ ((إقبَلِ الحَدِيقَةَ وطَلِّقْهَا تَطلِيقَةً) (رَوَاهُ البُخَارِيُّ برقم: (٥٢٧٣)، وَالنَّسَائِيُّ برقم: (٣٤٦٣)}، واتە: بوخاریی‌و نەسائیی لە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسەوە خوا لە خۆی‌و بابی ڕازی بێ گێڕاویانەتەوە، کە خێزانی سابیتی کوڕی قەیس کوڕی شەماس، هاتە لای پێغەمبەر ﷺ گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! نە لەڕووی ئەخلاقەوە نە لەڕووی دینەوە ڕەخنەم لە (ثابتِ بنِ قَيْسٍ)، {مێردەکەم} نیە، بەڵام پێم ناخۆشە لە ئیسلامەتییدا تووشی کوفر ببم {واتە: دوای ئەوەی کە مسوڵمان بووم‌و هاتوومەتە نێو ئیسلام، تووشی گوناه ببم}، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئامادەی باغەکەی بدەیەوە {دیارە سابیت باغێکی مارەیی داوە بەو خێزانەی خۆی} ئەویش دەڵێ: بەڵێ، پێغەمبەری خواش ﷺ بانگی سابیتی کوڕی قەیسی کردو فەرمووی: باغەکەی لێوەربگرەوەو بە یەك تەڵاق دەستی لێ هەڵبگرە،

لێرەدا گرنگە ئێمە بزانین کە ئەو ئافرەتە دەڵێ: من لە ڕووی دینیی‌و لە ڕووی ڕەوشتەوە ڕەخنەم لێی نیە، واتە: هەر شکڵ‌و دیمەنیم بە دڵ نیە،

یاخود حاڵەتی نەفسیی ئەوم بە دڵ نیە، گرنگ ئەوەیە لەبەر هۆیەك لە هۆیەكانی پێم خۆش نیە لەگەڵ ئەو پیاوەیدا بژیم، پێغەمبەر ﷺیش مەجالی داوە، هەڵبەتە شەرعزانان زۆر قسەیان كردوە لەوبارەوە كە دەبێ ئافرەتەكە حەتمەن بەڵگەیەكی هەر هەبێت، ئەوجار ئەو مافەی هەیە كە داوای دارنین (خُلْع)ی مێردەكەی بكات، بەڵام بەپێی ئەم فەرموودەیەو بەپێی ئایەتەكەش كە دەفەرموێ: ﴿فَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا يُقِيمَا حُدُودَ اللَّهِ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِمَا فِيمَا افْتَدَتْ بِهِ﴾، واتە: ئەگەر مەترسییتان هەبوو، ئەو ژن‌و مێردە یاساكانی خوا جێبەجێ نەكەن‌و سنوورەكانی خوا نەپارێزن، گوناحتان ناگاتێ كە ئافرەتەكە خۆی بكڕێتەوەو مارەییەكەی بۆ ڕەتبكاتەوەو لێك جیابنەوە، بەپێی ئایەتەكەو بەپێی ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەر ﷺ ئەم مەسەلەیە ئەو هەموو ئاڵۆزیی‌و مەرجانەی تێدا نین.

هەر لەوبارەوە ئەم فەرموودەیەش هەیە: {(رَوَى التِّرمِذِيُّ عَنْ الرُّبَيِّعِ بِنْتِ مُعَوِّذِ بْنِ عَفْرَاءَ أَنَّهَا اخْتَلَعَتْ عَلَى عَهْدِ النَّبِيِّ ﷺ فَأَمَرَهَا النَّبِيُّ ﷺ، أَوْ أُمِرَتْ أَنْ تَعْتَدَّ بِحَيْضَةٍ) (رَوَاهُ التِّرمِذِيُّ برقم: (١١٨٥)، وَصَحَّحَهُ الألباني في (سُنَن التِّرمِذِيّ)}، واتە: تیرمذیی دەگێڕێتەوە لە ڕوبەیعی كچی موعەووێذی كوڕی عەفراء لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ مێردەكەی لەخۆی دارنی {خۆی (خُلْع) كرد}، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێكرد كە بە حەیزێك عیددە بشوات {واتە: عیددەی ئافرەتێك كە مێرد لەخۆی دادەرنێ، بریتیە لە حەیزێك بەپێی ئەم فەرموودەیە}، بەڵام (القُرطُبي)[1] دەڵێ: {(عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: عِدَّةُ الْمُخْتَلِعَةِ عِدَّةُ المطلقة قَالَ: أبوداود وَالعَمَلُ عِندَنا عَلَى هَذَا قُلْتُ: وَهُوَ مَذْهَب مالك والشافعي وأحمد وإسحاق والثوري وأهل الكوفة قَالَ: التِّرمِذِيُّ وَأَكْثَرُ أَهْلِ العِلْمِ مِن أَصحَاب النَّبِيّ وغَيرهم)}، واتە: عەبدوڵڵای كوڕی عومەر خوا لێی ڕازی بێ، گوتوویەتی: عیددەی ئافرەتێك

١) (الجامع لأحكام القرآن)، ج: (٣)، ص: (١٢٦).

كە مێردی لە خۆی دادەڕنێ، عیددەی ئافرەتێكە كە تەڵاق دەدرێ‌و وەك هی ئەوە، ئنجا ئەبو داوود گوتوویەتی: ئیش لەسەر ئەوەیە لای ئێمە، گوتم: (قورتوبی دەڵێ:) ئەوە مەزهەبی مالیك‌و شافیعیی‌و ئەحمەدو ئیسحاق‌و سەورییە، وە هی ئەهلی كووفەیە، (واتە: ئەبوحەنیفەو هاوەڵانی)، وە تیرمۆذیی گوتوویەتی: ئەهلی عیلم لە هاوەڵانی بەڕێزیش‌و غەیری وانیش هەر ئیشیان بەوە كردوە.

بەڵام بۆ زانیاریتان ئافرەتێك كە خۆی (خُلْع) دەكات (خۆی دادەڕنێ)، ئەگەر بیەوێ بگەڕێتەوە لای مێردەكەی، یان مێردەكەی بیەوێ بیگێڕێتەوە لای خۆی، بەمەرجێ بە ڕەزامەندیی ژنەكە بێ، چونكە دوای تەڵاقێك دوو تەڵاقیش، ئەگەر ئافرەتەكە ڕازی نەبێ، پیاوەكە هەر ناتوانێ بیگێڕێتەوە لای خۆی، ئەوە لە دوای (خُلْع) پێویستی بەوە نیە ئەو ئافرەتە بچێ شوویەكی دیكە بكات، ئنجا بچێتەوە لای مێردە پێشووەكەی، بەڵكو بە گرێبەستێكی تازەو بە مارەییەكی تازە دەتوانێ بچێتەوە لای[1].

**مەسەلەی هەشتەم:** ئەگەر ژن بە ناهەق داوای جیابوونەوە لە مێردەكەی بكات گوناهێكی زۆر گەورە دەكات، بەڵام شەریعەتیش هەر ڕێی داوە، واتە: هەرچەندە لە خودی خۆیدا گوناحە، بە مەرجێك هەقی نەبێت‌و بە ناهەق یەخەی مێردەكەی بگرێ‌و بیەوێ لێی جیابێتەوە، بەڵام شەریعەت ڕێگاشی هەر پێداوە، هەروەك چۆن تەڵاقیش لە فەرمایشتی پێغەمبەردا ﷺ هاتوە: {(أَبْغَضُ الْحَلَالِ إِلَى اللَّهِ الطَّلَاقُ) (رَوَاهُ ابْنُ مَاجَهْ برقم : (٢٠١٨)، عَبْدِاللَّهِ بْنِ عُمَرَ، وَضَعَّفَهُ الألباني في (إرواء الغليل) برقم: (٢٠٤٠)}، واتە: بوغزێنتراوترین شتی حەڵاڵ لای خوا تەڵاقە، بەڵام خوای تاك‌و پاك بۆچی

---

١) لەم مەسەلەیەدا ڕاجیایی هەیەو ئەوانەی (خُلع) بە (طلاق) دادەنێن، دەڵێن، بۆی نیە مەگەر مێردێكی بكاتەوەو پاش چوونە لای دەستی لێ هەڵبگرێ، ئەوجار، بەڵام من پێم (خُلع) (طلاق) نیەو شتێكی دیكەیە بۆیە لەو مەسەلەیەشدا لە (طلاق) جیایە، بڕوانە: (الجامع لأحكام القرآن) للقرطبي، ج: (٣)، ص: (١٢٦).

دایناوە؟ بێگومان لەبەر ناچاریی ژن‌و مێرد کە پێکەوە ژیانیان لێ تاڵ بووەو، پێکەوە ناژین‌و هەموو ڕۆژێ دەمەقرەیانە، کە دیارە ئەو حاڵەتەش هەر بۆ خۆیان باجەکەی نادەن، بەڵکو منداڵەکانیشیان باجەکەی دەدەن‌و خزمەکانیشیان باجەکەی دەدەن، لەبەر ئەوە ئەگەر هەر پێکەوە نەگونجان، ئەوە وەك دەڵێ: (وآخر الدواءِ الكَيُّ)، واتە: دوایین چارەسەرو دوایین دەرمان بریتیە لە سووتاندن، ئەگەرنا فەرموودەیەکی پێغەمبەر ﷺ هەیە، کە ئەو ڕاستییە ڕووندەکاتەوە کە دروست نیە ژن بەبێ هۆکارو پاساوی بەجێ داوای تەلاق‌و جیابوونەوە لە مێردی بکات: {(عَنْ ثَوْبَانَ رضي الله عنه، أنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: أيُّمَا امْرَأةٍ سَأَلَتْ زَوْجَهَا طَلاقاً مِنْ غَيْرِ بَأسٍ، فَحَرَامٌ عَلَيْهَا رَائِحَةُ الجَنَّةِ) (رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ برقم: (٢٢٢٦)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (١١٨٧)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٢٠٥٥)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (١٣٢٠)، وَصَحَّحَهُ الألباني في (إرواء الغليل) برقم: (٢٠٣٥)}، واتە: هەر ژنێك بە ناهەق‌و بەبێ پاساوو بەبێ بەڵگە داوا بکات لە مێردەکەی جیابێتەوە، ئەوە بۆنی بەهەشتی لێ قەدەغەیە. کە مەبەست ئەوەیە گوناهبار دەبێ هەر لەخۆیەوە لە مێردەکەی هەڵپێچێ، بەڵام شەریعەتیش ڕێگای داوە، هەڵبەتە زانایان لێرەدا مشتومڕیان هەیەو زۆربەیان دەڵێن: بۆی نیە مادام بەڵگەیەکی بەدەستەوە نەبێ، بەڵام هەندێکیان دەڵێن: بۆی هەیە.

وە من پێم وایە بەڕاستی ڕای هەندێکیان بەهێزترە لەهی زۆربەیان، ئەگەر ژنەکە هەر سوور بوو، بەڵێ گوناهبارە، بەڵام شەریعەت ئەو دەرفەتەی پێداوە، بۆچی؟! چونکە ئەگەر هەر سووربوو پیاوەکەش خۆشی لێنابینێ‌و ئەو ئافرەتەش ڕەنگە تووشی غەڵەت ببێ، وە ئەگەر منداڵیشیان هەبێ منداڵەکانیش باجەکەی دەدەن، کەواتە: تا زووتر لێك بترازێن باشترە، با ژنەکەش ناهەق بێ، بۆیەش ناهەقیەتی چونکە کاتی خۆی کە مێردی بەو پیاوە کردوە، لەبەرچاوی بووە، هەڵبەتە هەتا ئافرەت بۆخۆی ڕازی نەبێ‌و ئارەزوومەند نەبێت مارەیی نایەت‌و مارە ناکرێ، کەواتە: کە ڕازیبووەو بە ئارەزووی خۆی بووەو لەبەرچاوی

بووە، ئەدی ئێستا بۆچی لێی جیادەبێتەوە؟! بەڵێ، ئەگەر عەیبێکی هەبێ‌و لێی شاردبێتەوەو دوایی لێی دەرکەوێ، ئەو کاتە هەقیەتی، بەڵام کە هیچ گۆڕانی بەسەردا نەهاتبێ‌و پیاوەکە هەر وەك جاران بێ، کە کاتی خۆی بە دڵی خۆی کردوویەتی‌و ئێستا هەڵیدەپێچێ، ئەوە بە دڵنیایی گوناهبارە، بەڵام من پێم وایە ئەو ڕایە ڕاستە کە هەر بۆشی هەیە جیابێتەوە، چونکە جێدار (بدیل)ەکەی هەر چۆن بێ خراپترەو زیانی پترە.

**مەسەلەی نۆیەم:** ﴿ فَإِن طَلَّقَهَا فَلَا تَحِلُّ لَهُۥ مِنۢ بَعۡدُ حَتَّىٰ تَنكِحَ زَوۡجًا غَيۡرَهُۥ ﴾، ئەوە تەڵاقی سێیەمیانە، نەك ئەوەی کە هەندێك لە توێژەرەوانی قورئان گوتوویانە، کە دەفەرموێ: ﴿ أَوۡ تَسۡرِيحُۢ بِإِحۡسَٰنٍ ﴾، وەك پێشتریش لەوبارەوە دوایـن‌و پێویست ناکات دووبارەی بکەینەوە، بەڵێ تەڵاقی سێیەم ئا ئەمەیانە، چونکە خوا لە پێشەوە فەرموویەتی: ﴿ ٱلطَّلَٰقُ مَرَّتَانِ ﴾، ئنجا دوایی دێ باسی دوو تەڵاقەکان دەکات کە ئەنجامێکیان دێتە سەرێ! پاشان دەفەرموێ: ﴿ فَإِن طَلَّقَهَا ﴾، ئنجا ئەگەر جارێکی دیکەش تەڵاقیدا، ئەمە تەڵاقی سێیەمە، چونکە هەمووی یەك سیاقە، دەفەرموێ: ئەگەر بۆ جاری سێیەم تەڵاقیدا ﴿ فَلَا تَحِلُّ لَهُۥ ﴾، ئەو ژنە جارێکی دیکە بۆ ئەو پیاوە حەڵاڵ نابێتەوە، کە دوای ئەوەی عیددەی بەسەرچووە، بە نیکاحێکی نوێ‌و بە عەقدێکی نوێ بیهێنێتەوە لای خۆی، نەء! تەنیا دوای تەڵاقی یەکەم‌و دووەم بۆی هەیە، کە پێی دەگوترێ: (البَيْنونَة الصُغرى) لێك جیابوونەوەی گچکە، بەڵام جیابوونەوە دوای تەڵاقی سێیەم، پێی دەگوترێ: (البَيْنونَة الكُبرى) لێك جیابوونەوەی گەورە، واتە دوای تەڵاق سێیەم تازە ئەو ژنە لەو پیاوە قەدەغەیەو بۆی حەڵاڵ نابێ ﴿ حَتَّىٰ تَنكِحَ زَوۡجًا غَيۡرَهُۥ ﴾، تاکو ئەو ئافرەتە شوو بە پیاوێکی دیکە نەکات‌و، ئەو پیاوە نەچێتە لای، پاشان بە شێوەیەکی ئاسایی لەیەك جیانەبنەوە.

هەڵبەتە هەمیشە وشەی: (نكاح) لە قورئاندا بەمانای گرێبەست (عقد)و مارەكردن هاتوە، بەڵام لێرەدا بەمانای پێكەوە جووتبوون (وطأ) هاتوە، بۆچی؟ چونكە مێرد مارە ناكرێ، ﴿ حَتَّىٰ تَنكِحَ زَوْجًا غَيْرَهُ ﴾، دەبێ پێشێ مارە كرابێ لەو پیاوەو، بووبێتە مێردی، ئەوجار دەچێتە لای، كەواتە: ئەم: ﴿ تَنكِحَ ﴾ە، واتە: تاكو لەگەڵ مێردێكی دیكەی غەیری مێردی پێشووی جووتنەبێ، واتە: لێرەدا مەبەست لە: ﴿ تَنكِحَ ﴾، جووتبوونە، نەك مارەكردن، چونكە عادەتیش وایە ئافرەت خۆی مارە ناكاتو مارە دەكرێ، واتە: گرێبەستو مارەكردنەكە بۆخۆی ناكات، بەڵام خۆی جووتبوونەكە ئەنجام دەدا، بەس عەقدەكە سەرپەرشتیارەكەی ئەنجامی دەدات، بەڵام ئایا بەڵگەمان چییە لەسەر ئەوە كە دەبێ مێردی دووەم كە ئەو ژنە دێنێ، بەڵگەمان چەند فەرموودەیەكی پێغەمبەری خوایە ﷺ:

**یەكەمیان**: {(عَنْ عَائِشَةَ أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ رَضِيَ اللَّه عَنْهَا: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ سُئِلَ عَنِ الْمَرْأَةِ يَتَزَوَّجُهَا الرَّجُلُ، فَيُطَلِّقُهَا، فَتَتَزَوَّجُ رَجُلاً فيُطَلِّقُهَا قَبْلَ أَنْ يَدْخُلَ بِهَا، أَتَحِلُّ لِزَوْجِهَا الأَوَّلِ ؟ قَالَ: لا، حَتَّى يَذُوقَ عُسَيْلَتَهَا) (رَوَاهُ الْبُخَارِيُّ برقم: (٢٦٣٩)، وَمُسلم برقم: (٣٥١٥)}، واتە: عائیشە خوا لێی ڕازی بێ دایكی ئیمانداران گێڕاویەتەوە كە پێغەمبەر ﷺ پرسیاری لێكراوە دەربارەی ژنێك كە پیاوێك دەیهێنێو دەبێتە هاوسەری، دوایی دەستی لێ هەڵدەگرێو تەڵاقی دەداو ئەو ئافرەتە مێردێكی دیكە دەكات، بەڵام ئەو مێردەی دووەمی دەستی لێ هەڵدەگرێ پێش ئەوەی لەگەڵی جووت بێت، ئایا بۆ مێردی یەكەمی حەڵاڵ دەبێتەوە؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: {(لا، حَتَّى يَذُوقَ عُسَيْلَتَهَا)} نەخێر، هەتا شیرینایەتییەكەی نەچێژێ، (عُسَيْلَتَهَا) بچووككراوەی (عَسَلَة)یە، واتە: شیریناتیی، واتە: دەبێ لەگەڵی جووتبێ، ئەوە مەبەستەكەیە.

**دووەمیان**: هەروەها هەر لەوبارەوە ئەم فەرموودەیەش هەیە: {(عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ الله عَنْهَا قَالَتْ: جَاءَتِ امْرَأَةُ رِفَاعَةَ الْقُرَظِيِّ وَأَنَا وَأَبُو بَكْرٍ عِنْدَ النَّبِيِّ

ﷺ فَقَالَتْ: إِنَّ رِفَاعَةَ طَلَّقَنِي الْبَتَّةَ، وَإِنَّ عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ الزُّبَيْرِ تَزَوَّجَنِي وَإِنَّمَا عِنْدَهُ مِثْلُ هُدْبَتِي وَأَخَذَتْ هُدْبَةً مِنْ جِلْبَابِهَا، وَخَالِدُ بْنُ سَعِيدِ بْنِ الْعَاصِ بِالْبَابِ يَنْتَظِرُ لَمْ يُؤْذَنْ لَهُ، فَقَالَ: يَا أَبَا بَكْرٍ أَلاَ تَنْهَى هَذِهِ عَمَّا تَجْهَرُ بِهِ بَيْنَ يَدَيْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَمَا زَادَ رَسُولُ اللَّهِ عَلَى التَّبَسُّمِ، فَقَالَ: رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَتُرِيدِينَ أَنْ تَرْجِعِي إِلَى رِفَاعَةَ؟ لاَ، حَتَّى تَذُوقِي عُسَيْلَتَهُ وَيَذُوقَ عُسَيْلَتَكِ) (رَوَاهُ الْبُخَارِيُّ بِرقم: (٢٦٣٩)، وَمُسلم برقم: (٣٥١٢)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (١١١٨)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (١٩٣٢)}، واتە: عائیشە خوا لێی ڕازی بێ (دایکی مسوڵمانان) دەڵێ: خێزانی (رِفاعَةَ القُرَظِيِّ) هاتە لای پێغەمبەر ﷺ وە من و ئەبو بەکریش (واتە: بابی عائیشە خوا لێیان ڕازی بێ) لە خزمەت پێغەمبەر بووین ئافرەتەکە گوتی: (رِفاعَةَ القُرَظِيِّ) منی وازلێهێناوە بە یەکجاریی، {یان تەڵاقی یەکەمی داوەو لێی گەڕاوە تا عیددەی بەسەرچووە، یان دووەم بووە، بەهەمان شێوە یان سێیەم بووە}، وە (عَبْدَالرَّحمن بْنَ الزُّبَيرِ) منی مارەکردۆتەوە، بەڵام (عَبْدَالرَّحمن بْنَ الزُّبَيرِ) ئەوەی پێیەتی وەك پارچە پەڕۆیە، وە ئاماژەشی کرد بۆ (قولینچك)ی سەرپۆشەکەی، {مەبەستی ئەوە بوو کە ناتوانێ لەگەڵ خێزانیدا جووتبێ، یان ئەندامی نێرینەی زۆر گچکەیە} خالیدی کوڕی سەعیدی کوڕی عاصیش لە دەرگا بوو چاوەڕێی دەکرد، مۆڵەت نەدرابوو بێتە ژوورێ {چونکە ئەوە شتێکی تایبەتی ئەو ژن و مێردەیە} گوتی: ئەی ئەبو بەکر ئەرێ ئەو ئافرەتە قەدەغە ناکەی ئەو جۆرە قسانە لەلای پێغەمبەری خوا ﷺ دەکات؟ {ئەو جۆرە قسەیە دەکات و باسی مێردەکەی بەو شێوەیە دەکات} پێغەمبەری خوا ﷺ جگە لەوەی زەردەخەنەیەکی کرد هیچی نەفەرموو، {واتە: لێی گەڕا قسەکەی تەواو بکات، چونکە ئەوە شتێکی شەرعییەو ئەو ئافرەتە بۆی هەیە قسەی خۆی بکا، ئەگەر بە دڕۆش بێ، وەك گوتراوە: لە شەرعدا شەرم نیە، واتە: لە ڕوونکردنەوەی شتی شەرعییدا شەرم نیە} دوایی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئایا دەتەوێ بچیەوە لای ڕیفاعە ؟! {لای مێردە پێشووەکەت

دیارە ئەویش مەبەستی ئەوەبوو} فەرمووی نەخێر، دەبێ ئەو مێردەی دووەمت تامی تۆبكات تۆیش تامی وی بكەی {واتە پێكەوە جووتبن}.

**سێیەمیان**: حەدیسێكی دیكەش لەوبارەوە هاتوە، باسی مەسەلەیەك دەكات كە كوردەواریی خۆمان پێی دەڵێن: مارە بەجاش، ئەویش ئەوەیە كە پیاوێ ئافرەتێك مارە دەكات، هەر بۆ ئەوەی بۆ مێردی پێشووی حەڵاڵ بێتەوەو جارێ یان چەند جارێك لەگەڵی جووت دەبێ، بە حیساب بۆ ئەوەی بۆ مێردە پێشووەكەی حەڵاڵ بێتەوە، ئەمەش فەرموودەكەیە: {(عَنْ هُزَيْلٍ عَنْ عَبْدِاللهِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: لَعَنَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الْوَاشِمَةَ وَالْمُسْتَوْشِمَةَ، وَالْوَاصِلَةَ وَالْمَوْصُولَةَ، وَآكِلَ الرِّبَا وَمُوكِلَهُ، وَالْمُحَلِّلَ وَالْمُحَلَّلَ لَهُ) (رَوَاهُ النَّسَائِيُّ برقم: (٣٤١٦)، وَصَحَّحَهُ الألباني في (إرواء الغليل) برقم: (١٨٩٧))}، واتە: عەبدوڵڵا {كە وابپێدەچێ عەبدوڵڵای كوڕی مەسعوود بێ خوا لێی ڕازیبێ}، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لەعنەتی كردوە لە ئافرەتێك كە ئافرەتان یان پیاوان دەكوتێ[1]، وە ئافرەتێك كە داوا دەكات بكوترێت {واتە: خەتو خاڵی بۆ بكرێ} وە ئافرەتێك كە قژی خۆی دەبڕێو دەیداتە ئافرەتێكی دیكە لەخۆی بنێ، وە ئافرەتێك كە داوا دەكات قژی خەڵكی لەخۆی بنێ {واتە: وەك هەڵخەڵەتاندنی پیاوێك كە دەیەوێ مێردی پێبكات، یان قژی كورتە قژێكی درێژ لە خۆی دەنێ بۆ ئەوەی كابرا هەڵخەڵەتێنێ}، وە لەعنەتی لە كەسێك كردوە، كە سوود دەخوات، وە لە كەسێك كە سوود دەرخواردی خەڵك دەدات، وە لەعنەتی كردوە لە پیاوێك كە دەیەوێ ئافرەتێك بۆ پیاوێكی دیكە حەڵاڵ بكات، وە ئەوەی كە دەیەوێ ئافرەتەكەی بۆ حەڵاڵ بكرێتەوە.

وەك گوتم: ئەوە مارە بەجاشی پێ دەڵێن، ئەویش ئەوەیە كە ئافرەتێك مێردەكەی بۆ جاری سێیەم تەڵاقی داوە، پیاوێك دێ مارەی دەكاتەوەو جارێك یان پتر لەگەڵی جووت دەبێ، بۆ ئەوەی بە حیساب بۆ مێردی پێشێی حەڵاڵ

---

١) واتە: خاڵو نەخشەو نیگاریان لەسەر پێست دروست دەكات، كە پێی دەگوترێ: (وشم).

بکاتـەوە، ئـەوجار دوایـی تـەڵاقی دەدات، دیـارە ئـەمجۆرە مـارەکردن (نکـاح)ەش حەرامەو هەر دانـامەزرێ، چونکە پیـاو کە ئافرەت دێنێ، نـابێ بەمـەرج بێ، وە نابێ بۆ ئەوە بێ کـە بـۆ مێردەکـەی پێشووی حـەڵاڵ بکاتـەوە، بـەڵکو دەبێ بـۆ ئەوەبێ کە پێکەوە ژیـانی هاوسەری پێکبێنن، هەرچـەندە هەنـدێك لـە زانایـان گوتوویانە: ئەگەر هیچ باس نـەکرێو هـەر مەبەسـتی ئـەوەبێ کـە بیهێنـێو بـۆ مێردەکـەی حــەڵاڵ بکاتـەوە، بـێ ئـەوەی لـەنێوان ژنو مێردەکـەو کـابرادا ئـەو بڕیـارو ڕێککەوتن (إتفـاق)ە هـەبێ، ئەوە دروسـتە، بەڵام بـەپێـی فەرموودەکـەی پێغەمبـەر ﷺ وە فەرمایشتەکانی دیکەش ئەمـەش هـەر دروسـت نیـەو کـابرا گوناهبارەو بە زینـاکەر دادەنـرێ، جـا (التِّرمِذِيّ) گوتوویـەتی[1]: {(وَالْعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ أَهْلِ الْعِلْمِ مِنْ الصَّحَابَةِ مِنْهُمْ: عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ وَعُثْمَانُ بْنُ عَفَّانَ وَعَبْدُاللَّهِ بْنُ عَمْرٍو وَغَيْرُهُمْ وَهُوَ قَوْلُ الْفُقَهَاءِ مِنْ التَّابِعِينَ وَيروى ذَلِكَ عَن ابنِ عبَّاسٍ وابنُ مَسْعُود)}، واتە: وە لە لای زانایانی هاوەڵان کـردەوە هەر بەمـە کـراوە، کـە لەنێویانــدا: عومـەری کـوڕی خەتتـابو عوسمـانی کـوڕی عەففـانو عەبدوڵـڵای کـوڕی عومـەر، وە جگـە لەوانـیش، وە ئەمـە قسـەی شـەرعزانانە لـە شـوێنکەوتووان، هـەروەها لـە لـە عەبدوڵـڵای کـوڕی عـەبباسو عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوودیش گێڕڕاوەتەوە، خوا لە هەموویـان ڕازی بێ.

**مەسەلەی دەیـەم:** کـە دەفـەرموێ: ﴿ فَإِن طَلَّقَهَا فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِمَآ أَن يَتَرَاجَعَآ إِن ظَنَّآ أَن يُقِيمَا حُدُودَ ٱللَّهِ ﴾، واتە: جا ئەگـەر مێردی دووەمی تەڵاقیدا، ئـەو ژنـە لەگـەڵ مێـردە یەکەمەکـەی گوناهیـان ناگـات کـە بگەڕێنـەوە بـۆ لای یـەك، بەمەرجێـك بڕوایان وابێو قەناعەتیـان وابێ، کـە دەتوانن ئـەمجارە یاسـاکانی خـوا جێبـەجێ بکەنو، دەتوانن پابەندبن بە شـەریعەتەوە لە ژیانی هاوسـەرێتییـان دا، شـایانی باسیشـە، کە ئەم ڕستە قورئانییـە: ﴿إِن ظَنَّآ أَن يُقِيمَا حُدُودَ ٱللَّهِ ﴾، سێ جـار لـەم ئایەتەدا دووبارە بۆتەوە ئەمەش یانی: لە ژنو مێردایەتیدا دەبێ پیاو قەناعەتی

---

١) (المصباحُ المنير في تهذيب تفسير ابن كثير)، ص (١٦٧).

وابێ، کە دەتوانێ هەقی ئەو ئافرەتە بدات، وە ئافرەتەکەش قەناعەتی وابێ کە دەتوانێ هەقی ئەو مێردە جێبەجێ بکات، واتە: ژن‌و مێرد نابێ یەکدی هەڵدەخەڵەتێنن کە دەگونجێ لێرەدا ﴿ظَنَّ﴾، بەمانای گومان بێ‌و دەشگونجێ بەمانای عیلم بێت، بەڵام زیاتر ڕەنگە بەمانای گومان بێ، چونکە ئینسان یەقینی بۆ پەیدانابێ لە شتێکدا کە جارێ تەجرەبەی نەکردوە، بەڵام هەرچۆن بێ ئەو ڕستەیە ئەوە دەگەیەنێ، کە ژیانی هاوسەرێتی ژیانێکی هەستیارانەیەو ئافرەت‌و پیاو دەبێ لەسەر بناغەی قەناعەت بەیەك هەبوون، ژیانی هاوسەریی پێکبێنن، ئەگەرنا قۆڵی یەکدی نەبڕن‌و یەکدی فریونەدەن، بەتایبەتی بۆ جاری دووەم، ئەو ژن‌و پیاوە یەکدی تووشی سەرئێشە نەکەنەوە.

لێرەشدا دێینە کۆتایی ئەم دەرسەمان‌و لە خوای زاڵ‌و باڵادەست دەپاڕێینەوە کە هەموو لایەکمان سەرکەوتوو بکات، پابەندبین بە یاساکانی شەریعەتەوە، چ لە ژیانی هاوسەرێتیی‌و، چ لە هەموو هەڵسوکەوتەکانی دیکەی ژیان‌و گوزەرانماندا، وە بە تەئکید هەر کەسێك‌و هەر خێزانێك‌و هەر کۆمەڵگایەك پابەندبێ بە شەریعەتەوەو سنوورەکانی خوای بەرزو مەزن بپارێزێ‌و نەیانبەزێنی، لە گرفتاریی‌و سەرئێشەو ناڕەحەتیی دوور دەبێ، خوای بە بەزەیی لەو کەسانەمان بگێڕێ.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی چل و نۆیەمین

## پێناسـەی ئەم دەرسـە

لـەم دەرسەمانــدا لـە خزمـەت سێ ئایـەتی دیکـە دایـن لـە سـووڕەتی (البقـرة)، ئایەتـەکانی ژمـارە: (٢٣١و ٢٣٢و ٢٣٣) ئـەم سێ ئایەتـە هـەر درێژەپێـدەری بابـەتی پێشوون، کە خوا ﷻ تێیانـدا باسی چۆنیەتی مامەڵەکردن لەگەڵ ژنانی تەڵاقـدراو لەلایـەن مێردەکانیانـەوە دەکـات، واتـە ئەگـەر ئایەتـەکانی پێـشێ باسـی کـاتی تەڵاقـدانو چـۆنیەتی تەڵاقـدان بـوون، ئـەم ئایـەتانە باسـی دوای تەڵاقـدانن، کـە پیـاوو ئـافرەت پەیوەنـدییان چـۆن دەبێ، وە ئـەو منداڵانــەی کـە دەیانبـن، بەتایبەتی منداڵی شیـرە خۆرە، چۆن مامـەڵەی لەگەڵـدا بکەن، وە مەسـەلەی دایـەن بۆگرتنیو بەخێوکردنیو ... هتد.

﴿ وَإِذَا طَلَّقْتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَبَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَأَمْسِكُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ أَوْ سَرِّحُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ ۚ وَلَا تُمْسِكُوهُنَّ ضِرَارًا لِّتَعْتَدُوا۟ ۚ وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ فَقَدْ ظَلَمَ نَفْسَهُۥ ۚ وَلَا تَتَّخِذُوٓا۟ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ هُزُوًا ۚ وَٱذْكُرُوا۟ نِعْمَتَ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ وَمَآ أَنزَلَ عَلَيْكُم مِّنَ ٱلْكِتَٰبِ وَٱلْحِكْمَةِ يَعِظُكُم بِهِۦ ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ ﴿٢٣١﴾ وَإِذَا طَلَّقْتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَبَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَلَا تَعْضُلُوهُنَّ أَن يَنكِحْنَ أَزْوَٰجَهُنَّ إِذَا تَرَٰضَوْا۟ بَيْنَهُم بِٱلْمَعْرُوفِ ۗ ذَٰلِكَ يُوعَظُ بِهِۦ مَن كَانَ مِنكُمْ يُؤْمِنُ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ ۗ ذَٰلِكُمْ أَزْكَىٰ لَكُمْ وَأَطْهَرُ ۗ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴿٢٣٢﴾ وَٱلْوَٰلِدَٰتُ يُرْضِعْنَ أَوْلَٰدَهُنَّ حَوْلَيْنِ كَامِلَيْنِ ۖ لِمَنْ أَرَادَ أَن يُتِمَّ ٱلرَّضَاعَةَ ۚ وَعَلَى ٱلْمَوْلُودِ لَهُۥ رِزْقُهُنَّ وَكِسْوَتُهُنَّ بِٱلْمَعْرُوفِ ۚ لَا تُكَلَّفُ نَفْسٌ إِلَّا وُسْعَهَا ۚ لَا تُضَآرَّ وَٰلِدَةٌۢ بِوَلَدِهَا وَلَا مَوْلُودٌ لَّهُۥ بِوَلَدِهِۦ ۚ وَعَلَى

ٱلۡوَارِثِ مِثۡلُ ذَٰلِكَۗ فَإِنۡ أَرَادَا فِصَالًا عَن تَرَاضٖ مِّنۡهُمَا وَتَشَاوُرٖ فَلَا جُنَاحَ عَلَيۡهِمَاۗ وَإِنۡ أَرَدتُّمۡ أَن تَسۡتَرۡضِعُوٓاْ أَوۡلَٰدَكُمۡ فَلَا جُنَاحَ عَلَيۡكُمۡ إِذَا سَلَّمۡتُم مَّآ ءَاتَيۡتُم بِٱلۡمَعۡرُوفِۗ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ بِمَا تَعۡمَلُونَ بَصِيرٞ ﴿٢٣٣﴾ ﴾.

## مانای وشە بە وشەی ئایەتەکان

((وە هەرکاتێك ژنانتان تەڵاقدان، (بە تەڵاقی یەکەم، یان دووەم) وە گەیشتنە نزیك کاتی دیاریکراوی عیددەیان، یان بەشێوەیەکی پەسند بیانگێڕنەوە لای خۆتان، یان بە شێوەیەکی پەسند دەستبەرداریان بن، وە نەچن بۆ ئەوەی ستەمیان لێ بکەن بەشێوەی زیان پێگەیاندن بیانهێڵنەوە، وە هەرکەسێك وابکات ئەوە ستەمی لەخۆی کردوە، وە ئایەتەکانی خوا بەگاڵتە مەگرن، وە یادی چاکەی خوا بکەن بەسەرتانەوە، وە ئەو کتێبو حیکمەتەی بۆی ناردوونە خوارێ، ئامۆژگارییتانی پێدەکات، وە پارێز لە خوا بکەنو بزانن خوا بە هەموو شتێك زانایە ﴿٢٣١﴾ وە هەرکات ژنانتان تەڵاقداو گەیشتنە (کۆتایی) کاتی دیاریکراوی عیددەیان، ڕێگرییان لێ مەکەن کە هاوسەرگیریی لەگەڵ مێردەکانیاندا بکەن، مادام بەشێوەیەکی پەسند لەبەینی خۆیاندا پێکهاتبن، ئەوە هەرکەسێك لە ئێوە کە بڕوای بە خواو بە ڕۆژی دوایی هەیە، پێی ئامۆژگاریی دەکرێ، ئەوەتان زیاتر مایەی چاکییو پاکییتانە، وە خوا دەزانێو ئێوە نازانن ﴿٢٣٢﴾ وە دایکان بۆ ماوەی دووساڵی ڕەبەق شیر بە منداڵەکانیان دەدەن، بۆ کەسێك کە بیەوێ (ماوەی) شیر پێدان تەواو بکات، وە خاوەنی منداڵەکەش بژیوو پۆشاکی باوی دایکانی شیردەری لەسەرە، هیچ کەس لە توانا بەدەری لەسەر پێویست ناکرێ، نە دایك زیان بە منداڵەکەی دەگەیەنێ، نە باب، وە هەمان شت لەسەر میراتگریش پێویستە، جا هەر کات بە ڕەزامەندییو ڕاوێژی نێوانیان ویستیان (پێشوەخت) منداڵەکە لە شیر ببڕنەوە، گوناهیان ناگاتێ، وە ئەگەر ویستتان دایەنی شیردەر بۆ منداڵەکانتان بگرن، گوناهتان ناگاتێ بەمەرجێك ئەو (کرێ)یەی کە بڕیار دراوە بەشێوەیەکی

پەسند بیانـدەنێ، وە پارێز لـە خـوا بکـەن‌و، بـزانن کـە خـوا بینـەری ئەوەیـە کـە دەیکـەن ﴿٢٣٣﴾)).

## شیکـردنەوەی هـەندێـك لە وشـەکان

(أَجَلَهُنَّ): کە لە هەردوو ئایەتی یەکەم‌و دووەمدا هاتوە (الأَجَلُ: المدَّةُ المضروبَة لِلشَّيءِ) (أَجَلْ)، واتە: کاتی دیاریکراو بۆ هەر شتێك، ئەجەلی ئەو شتە واتە کاتی دیاریکراوی، یان کۆتایی کاتەکەی، کە دیارە بەپێی سیاق لـەو دوو ئایـەتی یەکەم‌و دووەمـەدا ماناکـەی جیـاوازە، وەك دوایی باسی دەکەین.

(ضِرَارًا): واتـە: زیـان پێگـەیاندن، (الضُّرُّ: سُوُءِ الحَالِ، ضَارَّهُ مُضَارَّةً وضِرَاراً: ضَرَّهُ)، (ضُرّ) واتە: حالّی خراپ، وە (ضَارَّهُ مُضَارَّةً وضِرَاراً) بەمانـای (ضَرَّهُ) دێـت، واتـە: زیانی پێگـەیاند.

(هُزُوًا): (الهُـزْءُ: مَـزْحٌ فـي خِفْـيَةٍ)، (هُـزْءُ) یـان (هُـزواً) بـەمانای گـاڵتـە پێکردنێکی ئەنهانـە.

(فَلَا تَعْضُلُوهُنَّ): واتە: رێیـان لـێ مەگرن، پەرچیان مەهێننـەرێ، وشـەی (عَضْل)، واتە: (مَنْع)، رێ لێگـرتن، (العَضَلَةُ: كُلُّ لَحْمٍ صُلْبٍ فـي عَصَبٍ)، واتـە: هەموو گۆشتێکی پتـەوە کە لەنێو دەماردابێ، بە کوردیـی بە (عَضَلَة) دەڵێن: ماسولکـە، (وَرَجُـلٌ عَضِلٌ: مُكْتَنِزُ اللَّحْمِ) دەگـوترێ: پیـاوێکی تۆکمـەو دامـەزراو (وَعَضَلْتُهُ: شَدَدْتُهُ نحو عَصَبْتُهُ وَتُجُوِّزَ بِهِ فـي كُلِّ مَنْعٍ شَدِيدٍ)، واتە: توندم کرد، وە (عَضَلَ) بەکـارهێنراوە بـۆ هـەر نەهێـشتنێکی تونـد، وە لە زمانی عەرەبیـدا دەڵێ: (وعَضَّلَتِ الدَّجَاجَةُ بِبَيْضِهَا، والمَرأَةُ بِوَلَدهَا: إذا تَعَسَّرَ خروج البيض والوَلَدِ مِنهُما) واتـە: ئەگـەر مریـشکەکە هێلکـەی بـۆ نەکـرا، وە ئافرەتەکـە منداڵەکـەی ئاڵـقاو بەئاسـانی لێـی جیانـەبۆوە، وشـەی (عَضَّلَتِ)یان بۆ بەکـاردێ.

(**ٱلرَّضَاعَةَ**): واته: شیر پێدان، (يُقالُ: رَضَعَ المَوْلُودُ يَرْضِعُ، وَرَضَعَ يَرْضَعُ رَضاعاً وَرَضَاعَةً)، (رَضَعَ) یانی: منداڵەکە شیری خوارد، بەڵام ئەگەر بویستری بگوترێ دایك شیریدا بە منداڵەکەی دەگوترێ: (أَرْضَعَتِ الأُمُّ وَلَدَها).

(**وُسْعَهَا**): واته: بەپێی توانا (وُسْع) واته: توانا، (السَّعَةُ: تقالُ في الأمْكَنَةِ وَفي الحالِ، وفي الفِعْلِ، والوُسْعُ مِنَ القُدْرَةِ مَا يَفْضُلُ عَنْ قَدْرِ المُكَلَّفِ..) واته: (سَعَةُ) یانی: فراوانیی لە شوێنداو لە حاڵداو لە کردەوەدا، وە (وُسْع)یش توانایەکە کە لە بڕستی ئینسان زیاد دەبێ، واته: بۆی بکرێو بتوانێ ئەنجامی بدات، نەك هەموو توانایەکەی بێ، بەڵکو لەخۆی زیادبێ.

(**فِصَالًا**): واته: شیرلێ بڕینەوە (الفَصْلُ: إبانَةُ أَحَدِ الشَّيْئَيْنِ مِنَ الآخَر: حَتى يَكونَ بينَهُما فُرْجَةٌ)، واته: (فَصْل) بریتیە لە لێك جیاکردنەوەی دووشتان تا کەلێنیان دەکەوێتێو نێوانیان دەکەوێتێ، (الفِصَالُ: التَّفْرِيقُ بَيْنَ الصَّبيِّ وَالرِّضَاعِ)، واته: (فصال) بریتیە لە جیاکردنەوەی منداڵ لە شیرخواردن، بە کوردی دەگوترێ: لەشیربڕینەوە.

(**وَتَشَاوُرٍ**): واته: ڕاوێژ پێکەوەکردن، ڕاوێژی دوو تەرەف یاخود زیاتر بەیەکەوە.

(شُرْتُ، العَسَلَ وأشَرْتُهُ: أَخرَجتُهُ) عەرەب دەڵێن: (شُرتُ العَسَلَ)، واته: هەنگوینەکەم گرت، واته: لە شوێنی خۆی دەرمهێنا (وأَشَرْتُهُ) هەر بەمانای هەنگوینەکەم وەرگرت (وشِرْتُ الدابة: إستَخرجت عَدْوها) واته: ولاخەکەم تاقی کردەوە داخۆ چۆن دەڕوا ؟ (التَشَاوُر وَالمُشَاوَرَة والمَشُورَة: إستِخْرَاج الرأي بِمرَاجَعَةِ البَعْضِ إلى البَعْض) واته: (التَشَاوُر وَالمُشَاوَرَة والمَشُورَة)، واته: دەرهێنانی ڕای پەسند، لە ئەنجامی ئەوەدا کە قسە لەگەڵ یەکدیدا بکرێتو پێکەوە ڕاوێژ بکرێت.

## هـۆی هاتنــە خوارەوەی ئایەتەکــان

١) هـۆی هاتنـە خـوارەوەی ئـەم ئایەتـە موبارەکـەی کـە دەفـەرموێ: ﴿ وَإِذَا طَلَّقْتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَبَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَأَمْسِكُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ أَوْ سَرِّحُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍۚ وَلَا تُمْسِكُوهُنَّ ضِرَارًا لِّتَعْتَدُوا۟ۚ وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ فَقَدْ ظَلَمَ نَفْسَهُۥۚ وَلَا تَتَّخِذُوٓا۟ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ هُزُوًاۚ وَٱذْكُرُوا۟ نِعْمَتَ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ وَمَآ أَنزَلَ عَلَيْكُم مِّنَ ٱلْكِتَٰبِ وَٱلْحِكْمَةِ يَعِظُكُم بِهِۦۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ ﴾، لـەوبارەوە ئـەم بەسـەرهاتە گێـڕدراوەتەوە: {(قَـالَ ابْـن عبَّـاسٍ، ومُجَـاهد، ومَسـروقٌ والحَسَـن وقَتَـادَة والـضُحَاك والربيـع ومقاتـل بـن حيَّان وغَير وَاحِدٍ: كَانَ الرَّجُلُ يُطَلِّق المَرْأَة، فَإِذَا قَارَبَت انقضاءَ العِدّة رَاجَعها ضِرَاراً، لِئَلاّ تَذْهَب إلى غَيْرِهِ، ثُمَّ يُطَلِّقها فتعتدُّ، فَإِذَا شارفت عَلَى انقضاء العِدَّة طلَّق لِتَطُولَ عَلَيْهَا العِدَّة، فَنَهَاهُمُ اللهُ عَنْ ذَلِكَ) (رَوَاهُ ابـن أبـي حـاتم)}[1]، واتـە: عەبـدوڵڵای کـوڕی عـەبباس خـوا لێـی ڕازیبـێ‌و موجاهیـدو مەسرووق‌و حەسەنی بەصرییو قەتادەو ضەحاك‌و ڕەبیع‌و موقـاتیلی کـوڕی حەییان‌و هی دیکەش، گێڕاویانەتەوە کە ئەم ئایەتە بەو بۆنەوە هاتـە خـوار، کـە لە سـەردەمی نەفامییدا {کە دیارە کە دەڵێن: سەردەمی نەفامیـی واتـە: ئـەوە درێژیش بۆتەوە تا هاتنـە خـوارەوەی ئـەم ئایەتـەش‌و لـە سـەردەمی ئیسلامیـشدا هـەر وا کـراوە}، پیـاوێك ژنـی خـۆی تــەڵاق دەدا، کـاتێك کـە نزیـك دەبـۆوە عیـددەی بەسەربـچێ {ئەگـەر عیـددەی بەسەرچـوو - وەك باسمـان کـرد - ئـەو ئافرەتـە جیـا دەبێتـەوە لـەو پیـاوەو دەتوانـێ شـوێکی دیکـە بکاتـەوە، بـا یـەك تەڵاقیـشی دابێـت‌و، ئـەو کاتـە پێـی دەگـوترێ: جیابوونـەوەی گـچکە (البینـونة الصُغری)} ئەو کابرایە کە ژنەکەی تەڵاقداوە، پێش ئەوەی عیددەی بەسەربچێ

١) (المصباحُ المنير...)، ص: (١٦٩) .

دەیگێڕایەوە بۆ لای خۆی، بۆ ئەوەی کە زیانی پێبگەیەنێ‌و ئەو ئافرەتە ڕێی نەبێ شوویێکی دیکە بکاتەوەو، دووبارە تەڵاقی دەدایەوەو دیسان ئافرەتەکە دەکەوتە عیددەوەو کە نزیک دەبوو عیددەی بەسەربچێ، دووبارە دەیهێنایەوە بۆ لای خۆی‌و دیسان تەڵاقی دەدایەوە، تاکو عیددەی درێژبێتەوەو نە بۆخۆی وەك مێرد مامەڵەی لەگەڵدا دەکردو نە ڕێشی دەدا مێردێکی دیکە بکات، ئیدی خوای بە بەزەیی ئەم ئایەتەی نارده خوارو نەهی لێکردن لەو ڕەفتارە.

٢) هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو ئایەتە، کە دەفەرموێ: ﴿ وَإِذَا طَلَّقْتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَبَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَلَا تَعْضُلُوهُنَّ أَن يَنكِحْنَ أَزْوَٰجَهُنَّ إِذَا تَرَٰضَوْا۟ بَيْنَهُم بِٱلْمَعْرُوفِ ۗ ذَٰلِكَ يُوعَظُ بِهِۦ مَن كَانَ مِنكُمْ يُؤْمِنُ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْـَٔاخِرِ ۗ ذَٰلِكُمْ أَزْكَىٰ لَكُمْ وَأَطْهَرُ ۗ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴾، {(عَنْ مَعْقِلِ بْنِ يَسَارٍ أَنَّهُ زَوَّجَ أُخْتَهُ رَجُلاً مِنْ الْمُسلِمِينَ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَكَانَتْ عِنْدَهُ مَا كَانَتْ، ثُمَّ طَلَّقَهَا تَطْلِيقَةً لَمْ يُرَاجِعْهَا حَتَّى انْقَضَتْ الْعِدَّةُ، فَهَوِيَهَا وَهَوِيَتْهُ ثُمَّ خَطَبَهَا مَعَ الْخُطَّابِ، فَقَالَ لَهُ: يَا لُكَعُ، أَكْرَمْتُكَ بِهَا وَزَوَّجْتُكَهَا فَطَلَّقْتَهَا، وَاللَّهِ لاَ تَرْجِعُ إِلَيْكَ أَبَدًا آخِرُ مَا عَلَيْكَ، قَالَ: فَعَلِمَ اللَّهُ حَاجَتَهُ إِلَيْهَا، وَحَاجَتَهَا إِلَى بَعْلِهَا، فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَبَارَكَ وَتَعَالَى: ﴿ وَإِذَا طَلَّقْتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَبَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ ﴾ إِلَى قَوْلِهِ: ﴿ وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴾، فَلَمَّا سَمِعَهَا مَعْقِلٌ قَالَ: سَمْعًا لِرَبِّي وَطَاعَةً ثُمَّ دَعَاهُ فَقَالَ: أُزَوِّجُكَ وَأُكْرِمُكَ وَزَادَ ابن مردويه: وَكَفَّرتُ عَنْ يَمِينِي) (رَوَاهُ التِّرمِذِيُّ بِرقم: (٢٩٨١)، وَصَحَّحَهُ الألباني في (إرواء الغليل) برقم: (١٨٤٣)}، واتە: (معقل بن يسار) خوای لێ ڕازی بێ {کە هاوەڵێکی بەڕێزی پێغەمبەر ﷺ بووە}، خوشکێکی خۆی دەداتە پیاوێك لە مسوڵمانان {کە لە پشتیوانان بووە وەك لە ڕیوایەتی دیکەدا هاتوە} لە ڕۆژگاری پێغەمبەردا ﷺ، ئەو ئافرەتە لای ئەو پیاوە دەمێنێتەوە وەك هاوسەر، دوایی مێردەکەی، یەك تەڵاقی دەدا بەڵام موراجەعەی ناکاتەوەو نایگێڕێتەوە بۆ لای خۆی هەتاکو عیددەی بەسەر دەچێ، {کە عیددەی بەسەرچوو چی لێ دێ؟ لێی جیادەبێتەوەو ئەو ئافرەتە بۆی

هەیە شووی دیکە بکاتەوە وە بۆشی هەیە بچێتەوە بۆ لای مێردەکەی بەگرێ بەستێکی تازەو بە مارەییەکی تازە} بەڵام دوایی هەم پیاوەکەی بۆوی پەشێمان بۆوەو حەزی کرد مارەی بکاتەوەو هەم ئافرەتەکەش دڵی بۆ مێردەکەی چۆوە، ئنجا لەگەڵ خوازبێنیکەران داخوازیی کردەوە، بەڵام (معقل) پێی گوت: (یالُكَعْ) {لە زمانی عەرەبیدا وەك بڵێی ناكەس بەچە، یان وشەیەکە بۆ کەسێك بەکاردێ کە بەکەم تەماشا بکرێ} من ڕێزم لە تۆ گرتو خوشکی خۆم پێداو لە تۆم مارەکرد، دوای تەڵاقیشتدا، سوێند بەخوا هەرگیز ناگەڕێتەوە بۆ لاتو ئەوە دوا کاتی بووە، لەگەڵ تۆ، بەڵام خوا ﷻ کە نهێنی نێو دڵەکان دەزانێ، زانی کە پیاوەکەش پێویستی بەو ژنەی خۆی هەیە، کە بیگێڕێتەوە بۆ لای خۆیو، ئافرەتەکەش پێویستی بە مێردەکەیەتیو پێی خۆشە بچێتەوە بۆ لای، بۆیە ئەم ئایەتەی نارده خوار: ﴿ وَإِذَا طَلَّقْتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَبَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ ﴾، هەتا دەگاتە ﴿ وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴾، {واتە: ئایەتەکە هەمووی}، جا کاتێك (معقل) ئەم ئایەتەی بیست {گەرماو گەرم زانی لەسەر ئەو هاتۆتە خوار، بەڵێ چەمکەکەی فراوانو گشتی یە، بەڵام یەکەمین مەبەست لە ئایەتە کێبوو (معقل)ی کوڕی (یسار) بوو، جا بۆیە هەموو جارێ دەڵێین: زانایان ئەو بنچینەیان داناوە: (إنَّ خصُوصَ السَبَبِ لا يَمْنَعُ شمُول المَعنى)، واتە: هۆی هاتنە خوارەوەی تایبەت، ڕێ لە گشتگیریی واتا ناگیرێ، بە کێ کاتێك (معقل) ئەم ئایەتەی بیست} گوتی: فەرمانی پەروەردگارم دەبیستم وە بە قسەشی دەکەم، دوایی بانگی مێردەکەی کردو پێی گوت: لێشت مارەدەکەمو، ڕێزیشت دەگرم {ئەوان ئاوابوون، مادام خوا فەرموویەتیو خوا تەدەخولی کردوە تەواو ! جا خۆ مەرج نیە خوا هەموو جارێ ئایەتێکی تایبەت بۆ هەموو کەس بنێرێ، ئەم ئایەتەی ناردوە بۆ هەموو کەس کە دەکەوێتە ئەو هەڵوێستەوە، هەروەها هەموو ئایەتەکانی دیکەی قورئانیشی ناردوون بۆ هەر کەسێك کە دەکەوێتە ئەو جۆرە هەڵوێستانەوە، کە یەکەم جار ئەم ئایەتانەیان بۆ هاتوونە خوارێ}، (ابن مردويه) ئەوەشی بۆ زیاد کردوە: گوتی: وە ئەوە کەفارەتی سوێندەکەشم دەدەم.

٣) هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ڕستە قورئانییە، کە دەفەرموێ: ﴿ ...وَلَا تَتَّخِذُوٓاْ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ هُزُوًا ... ﴾، {(أَخْـرَجَ ابْـنُ الْمُنْـذِرِ وَابْـنُ أَبِـي حَـاتِمٍ عَـنْ عُبَـادَةَ بْـنِ الصَّامِت رضي الله عنه قَـالَ: كَـانَ الرَّجُـل عَلَـى عَهْـدِ رَسُـول الله ﷺ يَقُـول للرَّجُـل: زَوجَتُـكَ ابـنتي ثُـمَّ يَقُـولُ: كُنْـتُ لاعِبـاً يَقُـولُ: قَـد أعتقـتُ، ويقـول كُـنتُ لاعِبـاً، فَأَنْزَلَ اللهُ سُبحانَهُ: ﴿ ...وَلَا تَتَّخِذُوٓاْ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ هُزُوًا ... ﴾ فَقَـالَ: رَسُولَ اللهِ ﷺ ثَلاثٌ مَن قَالَهُـنَّ لاعِبـاً أو غيـر لاعـب فَهُـنَّ جائـزات عَلَـيهِ: الطَّلاقُ، وَالنِّكَـاحُ، وَالعِتَـاق)}[1]، واتـە: عوبـادەی کوڕی صامیت خـوا لێـی ڕازی بـێ {کە یەکێکە لە هاوەڵان} دەڵێ: پیـاوی وا هـەبوو لـە سـەردەمی پێغەمبـەردا ﷺ بـە پیاوێکی دیکـەی دەگـوت: ئەوە کچەکـەی خۆم لـێ مارەکـردی، دوایی دەیگوت: بـە گاڵتەم بوو، یـان هەبوو دەیگوت: ئەوە کۆیلـەکەم ئـازاد کرد، دوایی دەیگوت: بـە گاڵتەم بـووە، خوای پـاك ئـەم ئایەتـەی نـاردە خـوار: ﴿ ...وَلَا تَتَّخِذُوٓاْ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ هُزُوًا ... ﴾، ئایەتەکـانی خـوا بەگاڵتــە مەگـرن، {لـە خـۆڕا بڵـێ: ئـەوە لـێم مارەکردی، یان ئەوە ئەو شتەم پێبەخـشی دوایـی بڵـێ: گاڵـتەم لەگـەڵ کـردی} بۆیە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: سـێ شـت هەر کەسێك بە گاڵتە بیـانڵێت یان بە جیـددیی بیـانڵـێ، دەبـێ لەسـەری تێپـەڕن: {واتـە: مـولزەم دەکرێـت پێیانـەوە} تەڵاقدان و مارەکـردن و ئـازادکـردن.

کـابرا ناتوانێ بە خێزانەکەی بڵێ: تەڵاقم دای دوایـی بڵـێ، بـە گـاڵتەم بـوو، وە مارەکـردن (نکـاح)یش بەهەمان شێوە، ئەگـەر خوشکی خـۆی یـان کـچی خـۆی لـە کەسـێك مارەکــرد، دوایــی بڵــێ: بــە گاڵــتەم بــوو، هەروەهــا ئــازادکردنیش (عتــاق)یـش (واتـە: کۆیلـە ئـازادکردن) نابـێ بـە کۆیلەکـەی بڵـێ: ئـازادم کـردی، دوایی بڵێ بە گاڵتەم بووە، هەرچەندە سوپاس بۆ خـوا ئێـستا کۆیلـە نـەماون، کە لەڕاسـتیدا ئیسلام بنـاغەی ڕیشەکێشکردنی کۆیلایەتی دانـا.

---

١) (فَتحُ القَدير) للشَوكاني، ج (١)، ص (٣١٦- ٣١٧)

## مانـــای گشـــتی ئایەتەکـــان

خوا ﷻ هەر لەسەر چارەسەرکردنی هەڵـەو پەڵـەکانی بواری پەیوەنـدەیی ژنو مێـردایەتییو خێـزان، بەردەوامەو ڕوو لـە ئێمـەی بـڕوادار دەکات بەگشتی، دیارە یەکـەم جار ڕووی لە هـاوەڵانی بەڕێز کردوە خـوا لـێیان ڕازی بـێ، بـەڵام لـە پـشت ئەوانـەوە ڕووی لە هەمـوو بڕوادارانەو دەفەرموێ: ﴿ وَإِذَا طَلَّقْتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَبَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَأَمْسِكُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ أَوْ سَرِّحُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ ﴾، وە ئەگـــەر ژنانتـــان تەڵاقـــدانو گەیشتنە کۆتایی کاتی عـیددەیان، یان بـە شـێوەیەکی پەسـند دەسـتیان پـێوەبگرنو بیانهێڵنـــەوە، یـــان {ئەگـــەر دەزانـــن پێکـــەوە نـــاژین} بەشـــێوەیەکی پەســـند دەستبەرداریان بن، لێرەدا بەپێی سیاق بۆمان دەردەکەوێ کـە: ﴿ فَبَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ ﴾، مەبەسـت لـێی (أي قَارَبن نِهَـايةَ أجَلِ عِدَّتِهِـنَّ)، واتـە: نزیـك کەوتنـەوە لـەوەی عیـددەیان بەسەربچێ، چونکە ژن کە عیددەی بەسەرچوو مێرد تازە ناتوانـێ لەلای خۆی بیهێڵێتـەوە، مـەگەر دووبارە مارەی بکاتەوە، با تـەڵاقی یەکـەم، یان تـەڵاقی دووەمیـش بـێ، ئەگەر سـێیەم بـێ، ئـەوە هـەر هـیچ ، کـەواتە: ﴿ فَبَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ ﴾، وەك دوایی زیاتر ڕوونـی دەکەمـەوە، واتـە: نزیـك کەوتنـەوە لـەوەی کـە عیـددەیـان بەسەربچێ، ئەگـەرنا کـە عیـددە بەسەرچوو، نابـێ بیهێڵێـتەوە لای خـۆیو تـازە خێزانی ئەو نەماوەو لێی حەرامە. ﴿ وَلَا تُمْسِكُوهُنَّ ضِرَارًا لِّتَعْتَدُوا۟ ﴾، وە مەیانگرنە خۆتـانو مەیانهێڵنـەوە بـە دەسـتی خۆتانـەوە، بـۆ ئـەوەی زیانیـان پێبگەیـەننو سـنوورەکانی خـوا ببـەزێنن، واتـە: پیاوێـك کـە ژنەکـەی لـێ بەڵایـەو دەزانێت کـە پێکـەوە نـاگونجێنو تـەڵاقێکی داوە، یـان تەڵاقیـشی نـەداوە، بـەڵام هـەر بیـەوێ خەفەت خـانی بکاو نارەحـەتیی بکاو زیـانی پێبگەیـەنێ، حەرامـە، ئەگـەر دەزانـی هەقی ژنو مێردایـەتی لەگەڵ جێبـەجێ دەکاو مافەکانی پێدەدات، با بەردەوام بـن، بـــەڵام ئەگـــەر بزانـــێ مافـــەکانی پێنـــادات، دەبـــێ بەشـــێوەیەکی جوامێـــرانە

دەستبەرداری بێ‌و وازی لێبێنێ، ﴿ وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ فَقَدْ ظَلَمَ نَفْسَهُۥ ﴾، وە هەرکەسێك وا بکات، ئەوە مسۆگەر ستەمی لەخۆی کردوە، واتە: هەر کەسێك ژنەکەی لای خۆی بهێڵێتەوە، جا چ تەڵاقێکی دابێ‌و بەرلەوەی عیددەی بەسەربچێ هێنابێتیەوە لای خۆی، یاخود تەڵاقی دووەمی دابێ‌و پێش ئەوەی عیددەی بەسەر بچێ، وتبی: ئەوە هێنامەوە لای خۆم، بەڵێ تەڵاقەکەی، یان دوو تەڵاقەکانی تازە ڕۆیشتوون، بەڵام هەتا تەڵاقی سێیەمی دەدات، بۆی هەیە بیهێڵێتەوە، یاخود هەر تەڵاقیشی نەدابێت‌و هەر بیەوێ خێزانەکەی لەژێر کۆنترۆڵی خۆیدا بهێڵێتەوە، بەبێ ئەوەی مافەکانی بۆ دابین بکات، ئەوە زوڵمی لەخۆی کردوە، ﴿ وَلَا تَتَّخِذُوٓاْ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ هُزُوٗا ﴾، وە ئایەتەکانی خوا بەگاڵتە مەگرن، واتە: خوای پەروەردگار تەڵاقی بە تەڵاق داناوەو، نیکاحی بە نیکاح داناوەو، پێویستە جوان مامەڵەیان لەگەڵدا بکرێ، نەك خێزانیشی بێ خێزانیشی نەبێ، وەك خێزان مامەڵەی لەگەڵدا نەکات‌و بەپێی ڕواڵەتی شەرعیش خێزانی بێ! ئەوە گاڵتەکردنە بە ئایەتەکانی خوای باڵادەست، ﴿ وَٱذْكُرُواْ نِعْمَتَ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ ﴾، وە چاکەی خوا بەسەر خۆتانەوە یادبکەن‌و هەمیشە چاکەی خواتان لەبەرچاو بێت، ئایا ئەوە چاکەی خوا نیە ژنی بۆ پیاو ڕەخساندوەو، پیاوی بۆ ژن ڕەخساندوە، کە ئەگەر وانەبێ وەچەی بەشەر چۆن بەردەوام دەبێ لەسەر زەوی ؟! بێگومان ئەوە نیعمەتە، کە لەلایەکەوە ژن خزمەتی پیاو دەکات‌و ماڵی بۆ ڕادەگرێ، لەلایەکی دیکەوە پیاو خزمەتی ژن دەکات‌و بژێوی بۆ پەیدا دەکات‌و سەرپەرشتی دەکات، بەڵێ ئینسان دەبێ ئەو چاکەو نیعمەتەی خوای لەبەرچاوبێ.

﴿ وَمَآ أَنزَلَ عَلَيْكُم مِّنَ ٱلْكِتَٰبِ وَٱلْحِكْمَةِ يَعِظُكُم بِهِۦ ﴾، وە ئەوەی ناردوویەتە سەرتان لە کتێبی خۆی‌و لە حیکمەت ئامۆژگارییتانی پێدەکات.

(کتاب): لێرە بەمانای ئەو یاسا شەرعییانەیە کە قورئان گرتوونیە نێوخۆی.

وە (حکمة): لێرە بەمانای ئەو ڕەوشت‌و بەها بەرزو جوانانەیە، کە قورئان

گرتوونیە نێوخۆی، هەرکام لە (کتاب)و (حکمة) خوای زاناو توانا وشەی: دابەزاندن (إنزال)ی بۆ بەکارهێناون، کەواتە: هەردووکی ناردوونە خوارێو هەردووکیان لەنێو قورئاندان، بە پێچەوانەی تێگەیشتنی زۆر کەسەوە کە پێیان وایە: (کتاب)، واتە: قورئانو (حکمة)، واتە: سوننەتی پێغەمبەر ﷺ، خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ئەوەی بۆم ناردوونە خوار لە کتێبو حیکمەت ئامۆژگارییتانی پێدەکەم، ﴿ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ﴾، وە پارێز لە خوا بکەن، واتە: خۆتان بپارێزن لەوەی کە خوا لێتان تووڕەبێ، چونکە ئەگەر لێتان تووڕەبوو سزاشتان دەدا، ﴿ وَٱعْلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ ﴾، وە بشزانن کە خوا بە هەموو شتێك زانایە، فێڵ لە خوا ناکرێ، بۆیە ڕێكو ڕاست بن لەگەڵ خواو، چاكو پاك بن لەگەڵ خەڵك، ئەگەرنا خوا ﷻ فێڵی لێ ناکرێ.

ئەمجار دێت سەرباسی بابەتێکی دیکەو دەفەرموێ: ﴿ وَإِذَا طَلَّقْتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَبَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَلَا تَعْضُلُوهُنَّ أَن يَنكِحْنَ أَزْوَٰجَهُنَّ إِذَا تَرَٰضَوْاْ بَيْنَهُم بِٱلْمَعْرُوفِ ﴾، لە هۆی هاتنە خوارەوەکەی بۆمان دەردەکەوێ کە چەمكو واتای ئەم ئایەتە کە دەفەرموێ: وە ئەگەر ژنانتان تەڵاقدان، وە گەیشتنە کاتی دیاریکراویان، لێرە مەبەست لە (أَجَلَهُنَّ ) کۆتایی عیددەیە، واتە: ئەم ئەجەل (أَجَل)ەی ئێرە کۆتایی عیددەیە، وەك چۆن ئەوەی ئایەتی پێشێ پێش کۆتایی عیددە بوو، بۆچی؟ ئەوە بەپێی سیاق دەردەکەوێ، چونکە لێرە دەفەرموێ: ئەگەر ژنانتان تەڵاقدان، دوایی گەیشتنە کۆتایی کاتەکەیان ڕێیان لێ مەگرن بگەڕێنەوە بۆلای هاوسەرەکانیان، کەواتە: ئەو ژنە تەڵاقدراوە عیددەی بەسەرچووە، چونکە ئەگەر عیددەی بەسەرنەچووبێ، کەسوکاری بۆیان نیە ڕێی لێ بگرن بچێتەوە لای مێردەکەی خۆی، چونکە هەرخێزانی خۆیەتی، تەڵاقێکی، یان دووانی کەوتوون، بەڵام هەر خێزانیەتیو بۆی هەیە هەر لەماڵیشدابێ تا عیددەی بەسەر دەچێ، کەواتە: ئەگەر مەبەست پێش عیددە بەسەر چوون بووایە، پێویستی نەدەکرد فەرمووبای: ﴿ فَلَا تَعْضُلُوهُنَّ ﴾، کە بەتەئکید مەبەست پێی کەسوکاری ژنەکەیە، بەڵام ڕستەی:

﴿وَإِذَا طَلَّقْتُمُ ٱلنِّسَآءَ﴾، مەبەست پێی مێردەکانە، ئەو پیاوانەی کە ژنەکانیان تەڵاق دەدەن، جا ئەوە دوایی زیاتر تیشکی دەخەینە سەر کە لێرەدا خوا ﷻ ڕوو لە کۆمەڵگای مسوڵمان دەکات، هەرکام لە مێردەکان و کەسوکاری ئافرەتەکان بەیەك کوتلە دادەنێ و دەفەرموێ: ئەی پیاوەکان! ئەگەر ژنەکانتان تەڵاقدا، وە ئەی کەسوکاری ژنەکان! ڕێگر مەبن کە ژنەکان عیددەیان بەسەرچووو مێردەکان ویستیان دووبارە ژنەکان مارە بکەنەوەو بیانکەنەوە بە هاوسەر، ڕێیان لێ مەگرن، بەمەرجێك: ﴿إِذَا تَرَٰضَوْاْ بَيْنَهُم بِٱلْمَعْرُوفِ﴾، ئەگەر بەشێوەیەکی چاك لە بەینی خۆیاندا پێکهاتنەوە، واتە: هەم ژنەکەو هەم پیاوەکە، ئەگەر ڕێککەوتنەوە کە دووبارە مارەی بکاتەوەو مارەیی بداتێ، با کەسوکاری ژنەکە ڕێگرنەبن ﴿ذَٰلِكَ يُوعَظُ بِهِۦ مَن كَانَ مِنكُمْ يُؤْمِنُ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ﴾، ئا ئەوە ئامۆژگاریی هەرکامێك لە ئێوەی پێ دەکرێ، کە بڕوای بە خواو بە ڕۆژی دوایی هەبێ، واتە ئەوە ئامۆژگارییە کە بۆ ئێوە ئەگەر بڕواتان بەخواو بە ڕۆژی دوایی هەیە ﴿ذَٰلِكُمْ أَزْكَىٰ لَكُمْ وَأَطْهَرُ﴾، ئا ئەوەتان بۆ ئێوە زیاتر مایەی چاکیی و پاکیی یەو، زیاتر دەبێتە هۆی تەزکیەبوونتان و هۆی پاکبوونەوەتان، بە تەئکیدیش هەروایەو ئێمە ئەگەر پابەندبین بە قورئانەوەو بە فەرمانی خواوە، زیاتر تەزکیە دەبین و، گەشە دەکەین، لەڕووی ئیمانیی و ڕووحیی و ئەخلاقیی یەوەو، زیاتر پاك دەبین، هەم چاك دەبین هەم پاك دەبین، وە بە پێچەوانەوە بە ئەندازەی لادانمان لە قورئان و لە شەریعەتی خوا، تووشی پیس و پۆخڵیی دەبین و تووشی لاریی و خواریی دەبین، ﴿وَٱللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ﴾، وە خوا دەزانێ و ئێوە نازانن، بە تەئکید وایە ئەوەی کە خوا دەیزانێ کوا ئێمە دەیزانین؟! کەواتە: تۆ دەبێ بڵێی: مادام خوا وای فەرمووە، خوا چاکتر دەزانێ.

ئنجا دێتە سەر بابەتی شیردان بە منداڵ و دەفەرموێ: ﴿وَٱلْوَٰلِدَٰتُ يُرْضِعْنَ أَوْلَٰدَهُنَّ حَوْلَيْنِ كَامِلَيْنِ ۖ لِمَنْ أَرَادَ أَن يُتِمَّ ٱلرَّضَاعَةَ﴾، وە دایکان شیر دەدەن بە

منداڵەکانیان دوو ساڵی تەواو، بۆ هەر کەسێك بیەوێ ماوەی شیر پێدان تەواو بکات، واتە: دایکان (ئەو ژنانەی لە مێردەکانیان جیابوونەتەوە) شیر دەدەن بە کۆرپەکانیان هەرچەندە لەگەڵ مێردەکانیشیان لێك ترازاون، وە دەشگونجێ بڵێین: لێرەدا مەبەست گشتییەو دایك لەسەریەتی شیر بدات بە کۆرپەکەی، دیارە هەندێك لە زانایان دەڵێن: دایك لەسەری پێویست نیە شیر بدات بە کۆرپەکەی، بەڵکو باب لە بەرانبەردا پێویستە هەقی بداتێ، بەڵام ئەو ڕستە قورئانییە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە وانیە، چونکە لێرەدا خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَٱلْوَٰلِدَٰتُ يُرْضِعْنَ أَوْلَٰدَهُنَّ حَوْلَيْنِ كَامِلَيْنِ ۖ لِمَنْ أَرَادَ أَن يُتِمَّ ٱلرَّضَاعَةَ ﴾، واتە: حاڵەتی ئاسایی‌و سروشتیی ئەوەیە کە دایکان شیردەدەن بە منداڵەکانیان، ماوەی دووساڵ بۆ هەرکەسێك بیەوێ ماوەی شیر پێدان تەواو بکات، کەواتە: ئەوە ئەرکێکە لە ئەستۆی دایکان دایە، ﴿ وَعَلَى ٱلْمَوْلُودِ لَهُۥ رِزْقُهُنَّ وَكِسْوَتُهُنَّ بِٱلْمَعْرُوفِ ﴾، وە ئەوەی کە منداڵەکەش هی ئەوە، (دوایی ڕوونی دەکەینەوە بۆچی خوا ﷻ ئەم تەعبیرەی بەکارهێناوە ؟!)، واتە: بابەکان بژێوو پۆشاکی ئەو دایکانەیان لەسەرە بەشێوەیەکی پەسندو چاك، واتە: دەبێ بە شێوەیەکی باوو پەسند نان‌و نەفەقەو بەرگ‌و پۆشاکی ئەو ئافرەتانە دابین بکەن ﴿ لَا تُكَلَّفُ نَفْسٌ إِلَّا وُسْعَهَا ﴾، هیچ کەسێك لێی داوا ناکرێ مەگەر ئەوەی لە توانایدایە ﴿ لَا تُضَآرَّ وَٰلِدَةٌۢ بِوَلَدِهَا وَلَا مَوْلُودٌ لَّهُۥ بِوَلَدِهِۦ ﴾، نە هیچ دایکێك بۆی هەیە زیان بە منداڵەکەی بگەیەنێ، وە نە هیچ خاوەن منداڵێکیش بۆی هەیە زیان بە منداڵەکەی بگەیەنێ، ئەمە واتایەکی.

واتایەکی دیکەی ئەوەیە: با هیچ دایکێك بەهۆی منداڵەکەیەوە زیانی پێ نەگات، وە هیچ خاوەن منداڵێکیش (واتە: هیچ بابێکیش) بە هۆی منداڵەکەیەوە زیانی پێ نەگات، ﴿ وَعَلَى ٱلْوَارِثِ مِثْلُ ذَٰلِكَ ﴾، وە لەسەر میراتگریش هەمان ئەرك هەیە، واتە: ئەگەر بابەکە مرد کێ میراتی لێ دەگرێ، هەمان ئەرکی بەرانبەر بە منداڵەکەو بەرانبەر دایکەکەی لە ئەستۆ دایە ﴿ فَإِنْ أَرَادَا فِصَالًا عَن تَرَاضٍ مِّنْهُمَا

وَتَشَاوُرٍ فَلَا جُنَاحَ عَلَيۡهِمَا ﴾، جا ئەگەر ویستیان منداڵەکە لە شیر ببڕنەوە، بە مەرجێك بە ڕازیبوونی هەردووکیانو بە ڕاوێژی هەردووکیان بێ، گوناهیان ناگات، واتە: پێش تەواوبوونی ماوەی شیر پێدان کە دوو ساڵە، ئەگەر ویستیان پێش وەخت لێی ببڕنەوە، لەبەر هەر هۆیەك بێ، یان دایکەکە نەخۆش بوو، یان پزیشکێکی شارەزا گوتی: ئەو منداڵە خواردن بخوا باشترە لەو شیرە، هەر چۆنێکی بوو، گوناهیان ناگاتو مەجالی تێدایە.

﴿ وَإِنۡ أَرَدتُّمۡ أَن تَسۡتَرۡضِعُوٓاْ أَوۡلَٰدَكُمۡ فَلَا جُنَاحَ عَلَيۡكُمۡ ﴾، واتە: ئەگەر ویستتان شیردەر (دایەن) بۆ منداڵەکانتان بگرن، گوناهتان ناگاتێ، واتە: ئەگەر پیاوێك لەبەر هەر هۆیەك بوو، بۆ وێنە: دایکەکە ئامادە نەبوو شیر بدات بە منداڵەکەی، یان لەبەر ئەوەی لێی جیابۆتەوە، یان نەخۆش بوو، دایەنێکی بۆ منداڵەکە گرت گوناهی ناگاتێ، ﴿ إِذَا سَلَّمۡتُم مَّآ ءَاتَيۡتُم بِٱلۡمَعۡرُوفِ ﴾، ئەگەر ئەو هەقەی کە بۆتان دیاری کردون، بە شێوەیەکی پەسندو چاك تەسلیمی ئەو ئافرەتانەی بکەن، کە شیردەدەن بە منداڵەکانتان، ﴿ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ بِمَا تَعۡمَلُونَ بَصِيرٞ ﴾، وە پارێز لە خوا بکەنو بزانن کە خوا ئەوەی دەیکەن دەیبینێ، کەواتە: زۆر چاك حیسابی خۆتان بکەن، چونکە خوای زاناو شارەزا تێتانەوە ڕاماوەو تەماشاتان دەکات ! واتە: با جوان بێنە بەرچاوی خواو ڕەفتارو کردارتان جوان بێتە بەرچاوی خوا، وە با شتی ناقوڵاو دزێوی تێدانەبێتو خوای بینەرو بیسەر شتی ناشیرینو ناڕێکتان تێدا نەبینێ.

## چەند مەسەلەیەکی گرنگ

**مەسەلەی یەکەم:** وشەی: ﴿ أَجَلَهُنَّ ﴾، کە لە ئایەتی (٢٣١)دا هاتوە، وە لە ئایەتی (٢٣٢)شدا هاتوە، دوو واتای جیاوازی هەن، بۆچی؟ پێشتر ڕوونمان کردەوە کە دەبێ لە ئایەتی یەکەمدا ﴿ فَبَلَغۡنَ أَجَلَهُنَّ ﴾، بە مانای: لە کۆتایی

عیددە نزیك بوونەوە (قَارَبْنَ نِهَايَةَ العِدّة)بێت، چونکە پیاو کاتێك بۆی هەیە خێزانی لای خۆی بهێڵێتەوە، کە عیددەی ئەو تەڵاقەی داویەتی بەسەر نەچووبێ، دەنا ئەگەر بەسەرچوو، ئەوە ئەو ژنە لێی بێگانە دەبێ، مەگەر دووبارە داخوازیی بکاتەوەو، پاشان مارەیی تازەی بداتێو گرێبەستێکی تازەی لەگەڵدا ببەستێ، ئنجا دەبێتەوە بە هاوسەری، دیارە لە ئایەتی ژمارە: (٢٣٢)دا دیسان هەر دەفەرموێ: ﴿ فَبَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ ﴾، بەڵام لەوێدا بەمانای: گەیشتنە کۆتایی عیددە، (بَلَغنَ نهَايَةَ العِدَّة) هاتوە، بۆچی؟ چونکە ژن هەتا عیددەی بەسەرنەچێ، لە مێردەکەی بێگانە نەبووە، تاکو چارەنووسی بکەوێتە دەستی خزمو کەسی، داخۆ ئامادە دەبن بیدەنەوە بە مێردەکەی، یان نا ؟! وە هەتا لە عیددە دابێ، پیاوەکە هەر مێردیەتی، ئنجا لە ئایەتی دووەمیشدا خوا ﷻ ڕوو لە کەسوکاری ژنەکە دەکاتو دەفەرموێ: ئەگەر مێردەکانیان تەڵاقیان دان، وە عیددەیان بەسەرچوو، ڕێگرمەبن کە بچنەوە لای مێردەکانیان ئەگەر پێك ڕازی بوون (بە گرێبەستێکی تازەو بە مارەییەکی تازە) شایانی باسیشە ئەم دوو واتا جیاوازە بۆ وشەی: ﴿ أَجَلَهُنَّ ﴾، وەك: (القُرطُبي) لە تەفسیرەکەی خۆیدا دەڵێ[1]: یەك دەنگیی زانایانی لەسەرە، جا ئایا لێرەدا چیمان بۆ دەردەکەوێ ؟ ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ کە ئێمە بۆ تێگەیشتن لە ئایەتەکانی قورئان، دەبێ هەر وشەیەكو هەر ڕستەو ئایەتێك لە سیاقی خۆیداو، لە ڕیزبەندیی ڕستەو ئایەتەکانیدا تەماشای بکەین، ئەگەرنا یەك وشە جاری وا هەیە بە چەند واتایەك لە قورئاندا هاتوە، بۆ وێنە: وشەی (ظَنّ) لە هەندێك ئایەتدا بەمانای عیلم هاتوە، وەك خوای زانا دەفەرموێ: ﴿ ٱلَّذِينَ يَظُنُّونَ أَنَّهُم مُّلَٰقُواْ رَبِّهِمۡ وَأَنَّهُمۡ إِلَيۡهِ رَٰجِعُونَ ﴿٤٦﴾ ﴾البقرة، وشەی: (ظَنّ) لێرەدا نابێ بەمانای گومان بێ، چونکە ئەگەر کەسێك گومانی هەبێت کە بە دیداری خوا دەگات، ئەوە شایانی مەدح نیەو پێی ناگوترێ ئیماندار، بەڵکو لێرەدا (يَظُنُّونَ ) واتە:

---

١) (الجامع لأحكام القرآن)، ج: (٣)، ص: (١٣٤).

(یُوقِنُون، یَعلَمُون) دڵنیان، دەزانن کە دەگەنەوە لای خوا، کەچی لە شوێنی دیکەدا (ظَنّ) بە مانای گومانو دوو دڵیی هاتوە، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿... إِن يَتَّبِعُونَ إِلَّا ٱلظَّنَّ وَمَا تَهْوَى ٱلْأَنفُسُ... ﴿٢٣﴾﴾النجم، خوای بێهاوەڵ زەمی کافرەکان دەکاتو دەفەرموێ: هەر بەدوای گومانو بەدوای ئەوە دەکەون کە نەفسەکان دەیخوازن، لێرەدا (ظَن) بەمانای گومان بەکارهاتوە، وە هەرکاتێك وشەی (ظَن) بۆ ئەهلی کوفر بەکارهات، ئەوە بەمانای گومانو دوو دڵییە، بەڵام هەر کاتێك بۆ ئەهلی ئیمان بەکارهات، بەمانای یەقینو عیلمە.

**مەسەلەی دووەم:** کە دەفەرموێ: ﴿... وَلَا تُمْسِكُوهُنَّ ضِرَارًا لِّتَعْتَدُوا۟ ...﴾، واتە: خێزانەکانتان لای خۆتان مەهێڵنەوە بۆ ئەوەی زیانیان پێ بگەیەننو سنوور ببەزێنن، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە هیچ پیاوێك بۆی نیە بە مەبەستی ئەزیەتدان، هاوسەرەکەی لای خۆی بهێڵێتەوە، هەر بۆ ئەوەی دژایەتی بکاتو خەفەتخانی بکات، بەڵکو ئەگەر پێی ڕازییەو پێی وایە دەتوانێ مافەکانی بۆ دابین بکات، ئەوە هاوسەریەتی، ئەگەرنا خۆ ژنەکەی دوژمنی نیە ! بێگومان کابرا گوناهبار دەبێو وێڕای ئەوەش لە شەریعەتدا ئافرەتەکەش بۆی هەیە سکاڵا بکاتو خۆی دەرباز بکات، بەڵام ئەگەر گریمان ژنەکەش ئەوە نەکات، ئەوە پیاوەکە گوناهبار دەبێت.

**مەسەلەی سێیەم:** کە دەفەرموێ: ﴿... وَلَا تَتَّخِذُوٓا۟ ءَايَـٰتِ ٱللَّهِ هُزُوًا ...﴾، واتە: ئایەتەکانی خوا بەگاڵتە مەگرن، بەهۆی سەرنجدانی هۆی هاتنە خوارەوەکەی ماناکەی ڕوونە، کە مەبەست پێی چییە ؟ وە لەوبارەوە چەند فەرموودەیەکی پێغەمبەر ﷺ هەن، کە لەو بابەتانە مەجالی گاڵتەکردن نیە، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: {(ثَلَاثٌ جِدُّهُنَّ جِدٌّ وَهَزْلُهُنَّ جِدٌّ: النِّكَاحُ، وَالطَّلَاقُ، وَالرَّجْعَةُ) (رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ بِرقم: (٢١٩٤)، وَالتِّرمِذِيُّ بِرقم: (١١٨٤)، وَحَسَّنَهُ، وَابْنُ مَاجَهْ بِرقم: (٢٠٣٩)، وَالحَاكِمُ بِرقم: (٢٨٠٠)، وَصَحَّحَهُ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه،

وَحَسَّنَهُ الألباني في (إرواء الغليل) برقم: (١٨٢٦)}، واتە: سێ شت بە جیددیی بگیرێن هەر جیددیین، وە بە گاڵتە بگیرێن هەر جیددیین و هەر بەڕاستی دادەنرێن: نیکاح و تەلاق و گێڕانەوە، بۆ وێنە: کابرا خوشکێکی، یان کچێکی، یان ئافرەتێك کە لەژێر چاودێری ئەو دایە، لە یەکێك مارە بکات، دوایی بڵێ: بەگاڵتەم بووە، شتی وانیە، تەلاقیش بەهەمان شێوە، گاڵتەی تێدا نیەو، گێڕانەوە (رجعة)ش، بەهەمان شێوە، واتە: کەسێك خێزانی خۆی تەلاق داوە، دوایی پێش ئەوەی عیددەی بەسەربچێ بیگێڕێتەوە لای خۆی، ناکرێ بڵێ: بە گاڵتە هێنامیەوە، گاڵتە نیە! بە جیددیی بێ هەر جیددییەو، بە گاڵتەشبێ هەر بە جیددیی لەسەری حیسابە.

ئەم فەرموودەیەش لەوبارەوە هەیە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {(مَا بَالُ أَقْوَامٍ يَلعَبُونَ بِحدُودِ الله، يَقُولُ أَحَدُهُمْ: قَدْ طَلَّقتُكِ، قَدْ رَاجَعْتُكِ، قَدْ طَلَّقتُكِ قَدْ رَاجَعْتُكِ) (أَخْرَجَهُ ابْنُ مَاجَهْ، وَابْنُ جَرِير، وَالبَيْهَقِي)}، واتە: بۆچی هەندێ خەڵك گاڵتە بە سنوورەکانی خوا دەکەن ؟ یەکێ بە خێزانەکەی دەڵێت: تەلاقمدای، دوایی دەڵێت: هێنامیەوە، دوایی دەڵێت: تەلاقمدای، دوایی دەڵێت: هێنامیەوە.. ! واتە: ئەوە تەلاقی مسوڵمانان و ڕەفتاری مسوڵمانان نیە.

**مەسەلەی چوارەم:** کە دەفەرموێ: ﴿وَمَآ أَنزَلَ عَلَيۡكُم مِّنَ ٱلۡكِتَٰبِ وَٱلۡحِكۡمَةِ يَعِظُكُم بِهِۦ﴾، وە ئەوەی کە بۆی ناردوونە خوار لە کتێب و لە حیکمەت ئامۆژگاریتیانی پێ دەکات. لە قورئاندا زۆرجار وشەی کتێب و حیکمەت بەکارهاتوە، جارێ لە چوار شوێنان فێرکردنی کتێب و حیکمەت کراون بە دوو ئەرکی پێغەمبەر ﷺ وەك خوا دەفەرموێ: ﴿هُوَ ٱلَّذِي بَعَثَ فِي ٱلۡأُمِّيِّـۧنَ رَسُولٗا مِّنۡهُمۡ يَتۡلُواْ عَلَيۡهِمۡ ءَايَٰتِهِۦ وَيُزَكِّيهِمۡ وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡحِكۡمَةَ ...﴿٢﴾﴾الجمعة، وە لە دوو شوێن لە سوورەتی (البقرة)دا هاتووە و لە شوێنێك لە سوورەتی (آل عمران)یشدا هاتوە، جا ئایا کتێب و حیکمەت یانی چی ؟! ئەوەی من بۆم

دەرکەوتوەو پێشتریش چەند جارێك باسم کردوە، وشەی: (كتاب) بەمانای قورئان نیە، بۆچی؟ چونکە خوای پەروەردگار بۆ وێنە: لە سوورەتی (الجمعة) بۆ ئەرکی پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ﴿ هُوَ ٱلَّذِى بَعَثَ فِى ٱلْأُمِّيِّـۧنَ رَسُولًا مِّنْهُمْ يَتْلُوا۟ عَلَيْهِمْ ءَايَـٰتِهِۦ وَيُزَكِّيهِمْ وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلْكِتَـٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ وَإِن كَانُوا۟ مِن قَبْلُ لَفِى ضَلَـٰلٍ مُّبِينٍ ۝٢ ﴾الجمعة، واتە: خوا لەنێو نەخوێندەواراندا، (یان لەنێو نەشارەزایان لە کتێبە ئاسمانییەکاندا) خوا پێغەمبەرێکی ناردوە، جا سەرەتا دەفەرموێ: ﴿ يَتْلُوا۟ عَلَيْهِمْ ءَايَـٰتِهِۦ ﴾، ئایەتەکانی خوایان بەسەر دەخوێنێتەوە. (ئایەتەکانی خوا واتە: قورئان)، پاشان دەفەرموێ: ﴿ وَيُزَكِّيهِمْ ﴾، وە تەزکیەیان دەکات، ئەوە کاری دووەمی پێغەمبەرە ﷺ ئنجا دەفەرموێ: ﴿ وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلْكِتَـٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ ﴾، وە کتێبو حیکمەتیان فێر دەکات، ئەوە ئەرکی سێیەمو چوارەمی، جا ئەگەر بڵێین: مەبەست لە: ﴿ وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلْكِتَـٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ ﴾، یانی: قورئانو سوننەتیان فێردەکات، کەواتە: ئەرکێك وەك خۆی دووبارە دەبێتەوە، چونکە ئایەت خوێندنەوەکە قورئان بوو، ئەگەر مەبەست لە کتێبەکەش هەر قورئان بێت، دووبارەیە ! کەواتە: ئەوە وانیە، بەڵکو وشەی: (كتاب) لە هەندێك شوێندا بەمانای قورئان دێت، وە لە هەندێك شوێندا بەمانای ئەو تەوراتە دێ کە بە مووسا دراوە، بەڵام لەو شوێنانەدا کە (كتاب و حكمة) بەیەکەوە دێن، (كتاب) بە مانای ئەو بەرنامەو یاسایانەیە دێ، کە خوای زاناو توانا لە قورئاندا ناردوونی، ئەدی ئایا حیکمەت بە چ مانایەك دێت؟ حیکمەت بریتیە لەو ڕەوشتو ئەخلاقو بەها بەرزەو جوانانەی کە قورئان گرتوونیە خۆی، چونکە قورئان لە ڕووی بەرنامەییەوە دەبێتە دوو بەش: بەشێکی دەستوورو یاسایەو، بەشێکیشی ئەخلاقو ڕەوشتو بەهای بەرزە، ئنجا ئایا بەڵگەمان چییە لەسەر ئەوە ؟ بەڵگەمان ئەوەیە:

**یەکەم**: وشەی (کتاب) ئەگەر نەڵێین: بریتیە لە بەرنامەو یاسایەکان، ئەوە لەگەڵ ﴿ يَتْلُواْ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتِهِۦ ﴾دا، دەبێتەوە بە یەك، دەبێتە دووبارەبوونەوە.

**دووەم**: دەبینین لە قورئاندا خوای کاربەجێ وشەی حیکمەتی بۆ لوقمان خوا لێی ڕازی بێ، بەکارهێناوە، وەك دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا لُقْمَٰنَ ٱلْحِكْمَةَ ... ﴿١٢﴾ ﴾ لقمان، کەواتە: ئەگەر بڵێین: مەبەست لە: (حكمة) سوننەتە، دەبێ بڵێین: لوقمان سوننەتی پێغەمبەری ﷺ دراوەتێ ! پاشان خوا ﷻ بەگشتی باسی حیکمەتی کردوەو، فەرموویەتی: ﴿ وَمَن يُؤْتَ ٱلْحِكْمَةَ فَقَدْ أُوتِىَ خَيْرًا كَثِيرًا ﴿٢٦٩﴾ ﴾البقرة، واتە: وە هەرکەسێك حیکمەتی پێدرابێ ئەوە خێرێکی زۆری پێدراوە، کەواتە: دەگونجێ حیکمەت بە غەیری پێغەمبەرانیش بدرێ.

**سێیەم**: ئنجا لە سوورەتی (الإسراء)دا دوای ئەوەی، کە خوا دەفەرموێ: ﴿ وَقَضَىٰ رَبُّكَ أَلَّا تَعْبُدُوٓاْ إِلَّآ إِيَّاهُ وَبِٱلْوَٰلِدَيْنِ إِحْسَٰنًا ... ﴾، دەوری دە پازدە (١٠ - ١٥) ڕەوشتی بەرزو جوان، وە دە پازدە (١٠ - ١٥) خەسڵەتی خراپ دەخاتەڕوو، دوایی دەفەرموێ: ﴿ ذَٰلِكَ مِمَّآ أَوْحَىٰٓ إِلَيْكَ رَبُّكَ مِنَ ٱلْحِكْمَةِ ... ﴿٣٩﴾ ﴾ الإسراء، واتە: ئەوە ئەو حیکمەتەیە کە خوا بۆی ناردووی، ئەو حیکمەتە چییە ؟ بریتیە لە خۆڕازاندنەوە بە ڕەوشتی بەرزو جوان سیفەتو ئاکاری پەسند، وە خۆ دوورخستن لەو سیفەت نزمو خراپانەی کە بۆ دنیاو دوارۆژی ئینسان زیانن.

**چوارەم**: (الراغب الأصفهاني) لە (المعجم)ەکەی خۆیدا لە تەفسیری ئەو ئایەتەدا کە دەفەرموێ: ﴿ وَإِذْ ءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْفُرْقَانَ لَعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ ﴿٥٣﴾ ﴾ البقرة، واتە: یاد بکەنەوە کاتێك (کتاب)و (فرقان)مان، بە مووسا

بەخشین، بەڵکو ڕێی ڕاست بگرن، دەڵێ (هُمَا عِبارَتانِ عَنِ التَّوراةِ وتَسْمِيَتُها كِتاباً إعتِبَاراً بِما أُثْبِتَ فِيهَا مِنَ الأحْكَام، وتَسْمِيتُها فُرقَاناً إعتِبَاراً بِمَا فِيهَا مِنَ الفرقِ بينَ الحق والباطل) واتە: (الكتاب و الفرقان) هەردووکیان بریتین لە تەورات، بەڵام بۆیە ناونراوە (کتاب) بە ئیعتیباری ئەو یاسا شەرعییانەی کە تێیدان، وە پێی دەگوترێ فورقان بە ئیعتیباری ئەو جیاکردنەوەی هەقو ناهەقەی کە تێیدایە، کەواتە: قورئانیش پێی دەگوترێ: (کتاب) ئەگەر سەرنجی یاساکانی بدەینو، پێی دەگوترێ (حکمة) ئەگەر سەرنجی ئەو ڕەوشتو بەها بەرزانە بدەین، کە قورئان دەیەوێ فێری ئێمەیان بکات، وە ئەو خووو خەسڵەتە خراپانەی، کە قورئان دەیەوێ ئێمەیان لێ دوور بخاتەوە.

ئنجا هەندێك گوتوویانە: حیکمەت بە مانای سوننەتی پێغەمبەر دێت (السنة النبوية) دێ، بەڵام ئێمە دەڵێین: سوننەتی پێغەمبەر ﷺ بە مانای حیکمەت نیە، بەڵام بناغەی حیکمەتەو بەهۆی سوننەتی پێغەمبەرەوە ﷺ ئێمە ڕەوشتی بەرزو جوان فێردەبینو، لە خووو ڕەوشتی خراپ وەدوور دەکەوین، هەندێکی دیکە گوتوویانە: (الحِكْمَة: إصَابَةُ الحَقِّ بالعِلمِ والعَقْلِ)، واتە: حیکمەت بریتیە لە پێکانی هەق بە زانستو بە عەقڵ، یان گوتوویانە: (الحِكْمَة: إصَابَةُ الحَقِّ عِلْمَاً وَعَمَلاً)، واتە: حیکمەت بریتیە لە پێکانی هەق لە ڕووی زانستییەوەو لە ڕووی کردەییەوە.

ئێمەش دەڵێین: ڕاستە هەر کەسێك کە حەکیم بێو حیکمەتی هەبێ، دیارە کە دەبێ ئەهلی عەقڵو عیلم بێ، وە لە ڕووی تیۆریی (نظري)و کردەییەوە لەسەر هەق بێت.

**مەسەلەی پێنجەم:** کە دەفەرموێ: ﴿... وَمَآ أَنزَلَ عَلَيْكُم مِّنَ ٱلْكِتَٰبِ وَٱلْحِكْمَةِ يَعِظُكُم بِهِۦ ...﴾، وە ئەوەی خوا بۆی ناردوونە خوار لە کتێبو حیکمەت ئامۆژگاریی ئێوەی پێدەکات، ﴿يَعِظُكُم﴾، لە (وَعْظ)ەوە هاتوە، (وَعَظَ يَعِظُ

مَوْعِظِـةً)، (وَعْـظ) یـانی: چـی؟ بـه کـوردەواریی خۆمـان واتـه: ئامۆژگـارییو پێناسه کراوه بە: (الوَعْظُ: زَجْرٌ مُقتَرِنٌ بِتَخْوِيفٍ) واتـه: (وَعْظ) بریتیـه لـه تێخوڕینـێك، یـاخود ڕپرینگاندنـەوەی کەسێك لـه شتێك لەگـەڵ ترساندنی، وه هەروەها پێناسه کراوه بە: (الوَعْظُ: هُوَ التَّذكيرُ بالخَيْرِ بِمَا يَرِقُّ لَهُ القَلْبُ)، واتـه: بە بیـرهێنـانەوەی خێرو چاکەی کەسێك بە شێوەیەك كە دڵی پێی نـەرم بێت، بەڵام من پێم وایـه پێناسەکه بـەم شێوەیه ڕاستە: (الوَعْظُ: التَحرِيضُ عَلَى فِعْلِ الخَيْرِ و تَرْكِ الشَّرِ إنذَاراً وتَبشِيراً عَلَى أسَاسِ تَحرِيكِ العَوَاطِفِ والمَشَاعِرِ)، واتـه: هانـدانـه بـۆ کردنـی چـاکەو دوورکەوتنـەوه لـه خراپـه، بـه ترساندنەوەو بە دڵ خۆشکردنەوه، لەسەر بناغەی جووڵاندنی هەستو نەست.

**مەسـەلەی شەشـەم:** ﴿وَإِذَا طَلَّقْتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَبَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَلَا تَعْضُلُوهُنَّ أَن يَنكِحْنَ أَزْوَٰجَهُنَّ ....﴾، توێـژەرەوانی قورئـان لێـرەدا ئیـشکالێکیان بـۆ دروست بـووه، گوتوویانـه: سەرەتای ئایەتەکـه دەفـەرموێ: ﴿وَإِذَا طَلَّقْتُمُ ٱلنِّسَآءَ ...﴾، کەواتـه: دەبێ دواندنەکه لەگەڵ پیاوان بێ، لەگەڵ ئەو مێردانەی کە ژنەکانیان تـەڵاق دەدەن، چونکه پیـاو خـۆی ژن تەڵاق دەدات نەك کەسو کارەکەی ژنەکه تـەڵاق بـدەن ! ئنجـا ڕسـتەی دوایـی دەفـەرموێ: ﴿... فَلَا تَعْضُلُوهُنَّ أَن يَنكِحْنَ أَزْوَٰجَهُنَّ ...﴾، جا ڕێیان لـێ مـەگرن کـه بچنەوه لای مێردەکانیـان، ئەوەشـیان دیـاره لەگـەڵ کەسـوکاری ژنەکانیـەتی ! بـەڵام بەڕاستی (زَمَخْشَري) خـاوەنی تەفسیـری (الكَشَّاف) وەك (محمد رشيد رضا) لـه تەفسیـرەکەی خۆیـدا[1]، لێیـەوه نەقڵ کردوه، ڕایەکی جوانی لەوبارەوه هێنـاوه، دەڵێ: لێـرەدا خـوا ﷻ کۆمەڵگای مسوڵمان هەمووی وەك یـەك شت تەماشا دەکاتو دەفەرموێ: ئـەی کۆمەڵگـای مسوڵمان ! هـەر کاتێـك ئـەی پیاوەکـان ژنـەکانی خۆتـان تەڵاقـداو عیددەیـان بەسـەرچوو، ئەی کەسوکاری ژنەکـان ! ڕێگر مەبن لـه چوونەوەیان

---

١) (تفسير القرآن الحكيم)، ج: (٢)، ص: (٤٠٢) .

بۆ لای مێردەکەنیان، بە گرێبەستێکی تازەو بە مارەییەکی تازە، وە بەڕاستی ئەگەر بەو جۆرە تەفسیر نەکرێ، لەو ئیشکالە دەرباز نابین، وە ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە خوای پەروەردگار کە تەماشای کۆمەڵگا دەکات، هەمووی بەیەك چاو تەماشا دەکات، بەو واتایەی کە پێویست ناکات بفەرموێ: ئەی پیاوەکان ! ئەگەر ژنەکانتان تەڵاقدان، دوایی ئەی کەسوکاری ئافرەتان ! ئێوەش وا بکەنو وا مەکەن ! چونکە خوای زاڵو توانا قورئانی لە لووتکەی ڕەوانبێژییدا ناردوەو، هۆیەکی گرنگی ڕەوانبێژیش ئەوەیە کە قسەکە کورتبێو پوختبێو درێژ دادڕیی پێچەوانەی ڕەوانبێژیی یە، هەڵبەتە ئێمە لێرەدا بە پێی سەرنجدانی سیاق ناچارین بڵێین: دواندن (خطاب)ی یەکەمی سەرەتای ئایەتەکە، لەگەڵ ئەو پیاوانەیە کە ژنەکانیان تەڵاق دەدەن، چونکە ئەم ئایاتەنە هەموویان ڕووی دواندن لەو پیاوانەیە کە ژنەکانیان تەڵاق دەدەن، ئنجا دیارە ئەمەشیان دەبێ هەروابێ، وە هیچیان باسی کەسوکاری ئافرەتیان تێدانیە، بەڵام ڕستەکەی دیکە، واتە: ﴿ فَلَا تَعۡضُلُوهُنَّ أَن يَنكِحۡنَ أَزۡوَٰجَهُنَّ .... ﴾، ناگونجێ ڕووی لە پیاوانی ژن تەڵاقدەر بێو، ناچارین بڵێین: ڕووی دواندن (خطاب) لێرەدا لە کەسوکاری ژنەکانە، نەك لە مێردەکانیان، بۆچی؟ چونکە: دەبێ کەسوکاری ژن ڕێگا بدات، یان ڕێگربێ لەوەی کە ئەو ژنە بچێتەوە لای مێردەکەی، یان نەچێتەوە.

**مەسەلەی حەوتەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ إِذَا تَرَٰضَوۡاْ بَيۡنَهُم بِٱلۡمَعۡرُوفِ ﴾، هەرکاتێك پێکهاتن لە بەینی خۆیاندا بەشێوەیەکی پەسند، ئەوە دەگەیەنێ، کە پیاوو ئافرەت بۆیان هەیە بەمەبەستی هاوسەرگیریی بەشێوەیەکی پەسندو باش پێکەوە بدوێنو لەیەك تێبگەن، واتە: هەر ژنی تەڵاقدراو لەگەڵ پیاوێك کە ژنەکەی بۆ جاری یەکەمو دووەم تەڵاقداوە، نا ! بەڵکو هەرکاتێك پیاو ویستی هاوسەر بگرێ، پێویست هەوڵبدا لەگەڵ ئەو ئافرەتە لێك حاڵی بن، بەڵام بەشێوەیەکی پەسندو چاك ﴿ بِٱلۡمَعۡرُوفِ ﴾، هەوڵبدەن لە یەکدی تێبگەنو بەیەك ئاشنابن، داخۆ لەگەڵ یەکدا دەگونجێنو پێکەوە مەدار دەکەن یا نا ؟ دیارە ئەوەش ڕێیەکی نێوەڕاستە لەنێوان تێپەڕاندنو

بەزایەدانــدا، تێپەڕانـدنێك كـە لـە ڕۆژئـاوادا هەیـە، وە لـەنێو هەنـدێ خێزانـی بێبەنـدو بـاری نێـو مسوڵمانیـشدا هەیـە، كـە كـچ و كوڕەكـە پێكـەوە دەبـن بـە ڕەفیـق، بۆ ئەوەی پێـك ئاشـنابن، دوایی تووشی غەڵەت و پەڵەت دەبـن و، دەبێتـە مایەی شەرمەزاریی بۆ خۆشیان و بۆ هەردوو خێزانەكانیش، ئەوە تێپــەڕاندنەو ئەویدیكەش بەزایــەدانە، كـە نـاهێڵن ئـەو كـوڕە ئـەو ئافرەتـە ببینـێ، یـان ئـەو ئافرەتە ئەو كوڕە ببینێ و پێكەوە دابنیشـن بـە ئاگـاداری مـەحرەمیان، كەواتـە: ﴿إِذَا تَرَاضَوۡاْ بَيۡنَهُم بِٱلۡمَعۡرُوفِ﴾، یانی چی؟ واتە: بە شێوەی پەسـندو چـاك و بـە ئاگاداریی كەسوكاریان هەردووكیان یەكدی ببینـن و، كوڕەكـە وەزعـی خـۆی بـۆ كچەكە ڕوون بكـاتەوە: حاڵم وایـە، گوزەرانم وایە، ئایا تۆ چی دەڵـێی...؟ پێكەوە دەگونجێــین ناگونجێــین؟ ڕاوێـژی تێـدا بكـەن و قسـەی لـێ بكـەن، ئـەوە هیــچ ئیشكـالێكی شـەرعیی تێـدانیـە، بەڵكو ڕستەی: ﴿إِذَا تَرَاضَوۡاْ بَيۡنَهُم بِٱلۡمَعۡرُوفِ﴾، ئـەوە دەگــەیەنێ كـە ئـافرەت و پیـاو ئەگـەر بیانـەوێ ببنـە هاوسـەری یەكـدی، هـەردەبێ یەكـدی هەڵبسـەنگێنن و یەكـدی بناسـن، بـەڵام بەشـێوەیەك كـە لـە سنووری ئـەدەبە شەرعییەكان دابێ، ئا ئـەوە خـەتی نێـوە ڕاستەو ئەویدیكـەش یــەكیان تێپەڕانــدن و ئەویدیكــە بەزایەدانــەو، هــەم تێپەڕانــدن ئیــشكالات و كەموكووڕیـی زۆری لـێ پەیـدادەبێ و، هـەم بەزایـەدانیـش، جـارێ ئەوەیـان كـە ئەو پیـاوە ئەو ئافرەتەی نەناسیوە شارەزای نـەبووەو پێـك ئاشـنانین، دوایـی كـە دەبنە هاوسەری یەكدی، دەبینـن پێكەوە ناگونجێن و لێك جیـادەبنـەوە، جـا ئایـا باشتـر ئەوە نیە پێشتـر یەكدی بناسن و، بەرلەوەی نـاوی ژن و مێـردیان لـێ بـێ، یەكدی ببینـن و ئاگاداری یەكدی بن ؟! بە تەئكید وا باشتــرە، هەروەهـا ئـەوەی دیكەشیان كە بە بیانووی ناسین و لەژێـر پـەردەی پێـك ئاشـنابوونـدا دووچاری عەیبداریی و گونـاهباریی ببن، ئەویـش تێپـەڕاندنـەو خراپـە.

**مەســەلەی هەشــتەم:** كــە دەفــەرموێ: ﴿ذَٰلِكَ يُوعَظُ بِهِۦ مَن كَانَ مِنكُمۡ يُؤۡمِنُ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ﴾، ئەوە ئامۆژگـاریی پـێ دەكرێ لەئێـوە، هەركامێكتـان بڕوای بە خواو بـە ڕۆژی دوایـی هەیـە، ئـەوە دەگەیـەنێ كـە بابـای بڕوادارنـابێ ڕێـی هیـچ

کارێکی شەرعیی لە خێزانیو نیزیکانی بگرێ، دایکی، خوشکی، کچی، مادام شتێکی شەرعییە، وە نابێ لەمپەرو کۆسپیان بۆ دروست بکاتو بەهانەیان پێ بگرێو لە قوللەی قافیان بکێشێ! خوا ﷻ دەفەرموێ: ئەوە ئامۆژگارییتانی پێ دەکەم، هەر کامێك لە ئێوە بڕوای بە خواو بە ڕۆژی دوایی هەیە، کۆسپو پەرچ مەخەنە بەردەم ئەو ئافرەتەی کە تەلاق دراوەو دەیەوێ شوو بە مێردە پێشووەکەی بکاتەوە، ڕێی لێ مەگرن، ئەدی ئەگەر کچێك کە پیاوێکی مسوڵمان داوای کردوەو لە دینو ئەخلاقیشی ڕازین، بۆچیو چۆن ڕێی لێ بگیرێ؟! ئەگەر کابرا ژنەکەی تەلاقیش دابێ، خزمەکانی ناتوانن ڕێی لێ بگرن کە بچێتەوە لای مێردەکەی، مادام پێك ڕازی بن، چ جای کە مەسەلەکە هیچ گرفتو کۆسپی تێنەکەوتبێ! کە وەك گوتم ئەم مەسەلەیەش دیسان تێپەڕاندنو بەزایەدانی تێدا هەیە لە ئەنجامی ئەوەدا کە خەڵك پابەند نیە بە شەریعەتەوە.

**مەسەلەی نۆیەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ذَٰلِكُمْ أَزْكَىٰ لَكُمْ وَأَطْهَرُ﴾، ئا ئەوە بۆ ئێوە مایەی چاکیی زیاترو پاکیی زیاترە، یانی چی؟ یانی پابەندیی بە شەریعەتەوە، مایەی گەشەکردنو مایەی چاکییو پاکییە، وە بە پێچەوانەوە لادان لە شەرع، دەبێتە هۆی پیسییو پۆخڵیی، وە دەبێتە هۆی پووکانەوەو دەبێتە مایەی گرفتو سەرئێشە.

**مەسەلەی دەیەم:** کە دەفەرموێ: ﴿وَاللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ﴾، کەواتە: هەرکەسێك بڕوای بە خوا بێ ﷻ، لە بەرانبەر فەرمایشتی خوادا قسەی نیەو، نابێ کەس قسە لە قسەی خوادا بکات، ئەگەر ئیمانی هەبێ بە خوا، هەر کە گوتیان: خوای بەرزو مەزن وای فەرمووەو دڵنیا بووی کە خوا ﷻ وای فەرمووە، ئەوە لە هەقیدا ئاو ڕادەوەستێ، وە کەسێك کاتێك ئایەتێکی بۆ دەخوێنرێتەوە، یان پێی دەگوترێ: پێغەمبەر ﷺ وای فەرمووە، یان ئەوە یاسایەکی شەریعەتەو هەر ملەجیڕە تێدا دەکاتو نکوولیی لێ دەکات، بە تەئکید ئەوە ناتوانێت بەخۆی بڵێ مسوڵمان.

**مەسەلەی یازدەیەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ وَالْوَالِدَاتُ يُرْضِعْنَ أَوْلَادَهُنَّ حَوْلَيْنِ كَامِلَيْنِ لِمَنْ أَرَادَ أَن يُتِمَّ الرَّضَاعَةَ ﴾ لێرەدا ئەمە هەواڵەو بەمانای فەرمانە (إِخْبَار بِمَعْنَى الأَمْر): دایکەکان شیر دەدەن بە منداڵەکانیان بۆ ماوەی دوو ساڵی تەواو، ئەمە هەواڵە، بەڵام جاری وا هەیە خوای بەدیهێنەر شتێك بە صیغەی هەواڵ دەفەرموێ: کەچی مەبەستی پێ فەرمانە، کە ئەمەی ئێرە وایە، واتە: با دایکان شیر بدەن بە منداڵەکانیان بۆ ماوەی دوو ساڵ، جا ئەگەر دایکی شیری نەداتێ کە لە هەناوی خۆی بووە، ئەدی کێ بیداتێ ؟! وە شیری دایکیش باشترین خۆراکە بۆ منداڵ، هەڵبەتە دەشگونجێنێ بڵێین: مەبەست لەو ڕستە قورئانییە هەر هەواڵدانە نەك فەرمان، بەڵام خوای پەروەردگار دەیخاتە ڕوو کە حاڵەتی ئاسایی و سروشتی ئەوەیە کە دایك شیر بداتە منداڵەکەی و، ئەوی دیکە حاڵەتێکی نائاسایی و ناسروشتییەو، لە شەریعەتیشدا حاڵەتی ئاسایی و سروشتی دەبێ پابەندیی پێکەوە بکرێ و، حاڵەتی نائاسایی دەبێ وازی لێ بهێنرێ، ئنجا ئەمە هاندانی دایکانیشە کە شیر بە کۆرپەکانیان بدەن، ئەگەر لە مێردەکانیشیان جیابوونەوە، مادام دایکی ئەو کۆرپەیە با شیری بداتێ، چونکە لە هەناوی خۆی بووە !

**مەسەلەی دوازدەیەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ وَعَلَى الْمَوْلُودِ لَهُ رِزْقُهُنَّ وَكِسْوَتُهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ ﴾، واتە: ئەوەی کە منداڵەکە هی ئەوە، لەسەر خاوەنی منداڵەکەیە بژیوو پۆشاکی دایکە شیردەرەکان، بە شێوەیەکی پەسند، خاوەنی منداڵ کێیە؟! بێگومان: بابە، ئەدی بۆچی نەیفەرمووە: لەسەر بابەکان (وعَلَى الآبَاءِ) یاخود: لەسەر باب (وعَلَى الأَب) یان (وعَلَى الوَالِدِ) ؟ تاکو خوای کاربەجێ لەگەڵ ئەوەدا کە پێمان دەفەرموێ: بژێو دابینکردن و بەرگ و پۆشاك و جێگاو ڕێگا دابینکردنی ئافرەت لەسەر پیاوە، لێشمان حاڵی بکات کە لەڕووی نەسەب و ڕەچەڵەکەوە منداڵ پاڵ دەدرێتە لای بابی: ﴿ وَعَلَى الْمَوْلُودِ لَهُ ﴾، منداڵەکە هی کێیە؟ هی بابەکەیە، هەرچەندە ئێستا جارجار لە پەرلەمانی کوردستانی ئێمە باسی ئەوە

دەکەن، کە وەك چۆن منداڵ پاڵدەدرێتە لای بابی بۆ پاڵنادەدرێتە لای دایکیشی؟!
بێ هەواڵ لەوەی لەو رۆژئاواییەدا کە ئەوان تەقلیدی دەکەن، ژنیش پاڵدەدرێتەوە لای مێردی، بۆ وێنە: هاوسەری کلینتۆن دەڵێن چی؟ دەڵێن: هیلاری کلینتۆن، واتە: ژن لەقەبی مێردەکەی وەردەگرێ، بەڵام لە ئیسلامدا ئافرەت کچی بابی خۆیەتی، بەڵام لای ئەوان ژنیش پاڵدەدرێتە لای مێردەکەی، کەچی کۆلکە عەلمانییەکانی ئێمە دەڵێن: دەبێ لێرە منداڵیش پاڵ نەدرێتە لای بابی بە تەنیا ! نازانن ئەوە پێچەوانەی سروشتو پێچەوانەی عەقڵو مەنتقیشە، چونکە پیاوێك کە دوو سێ خێزانی هەن منداڵەکانی بڵاودەبن، بەس ناگونجێ دوو سێ باب هەبن، هەریەك بابە کە هەموویان خڕدەکاتەوە، بەڵام ئەگەر پاڵدرێنە لای دایکەکان بڵاودەبن !

**مەسەلەی سێزدەیەم:** کە دەفەرموێ: ﴿وَعَلَى ٱلْوَارِثِ مِثْلُ ذَٰلِكَ﴾، وە میراتگرەکەش هەمان ئەرکی لەسەرە، واتە: میراتگری باب، کێ میرات لە بابی ئەو منداڵە دەگرێ، ئەوە هەمان ئەرکی بەرانبەر ئەو دایکەش کە شیر ئەو منداڵەش دەدا، لەسەرشانە، یاخود دەشگونجێ بڵێین: (وعَلَى الوارِث)، واتە: میراتگری منداڵەکە، کێ میرات لە منداڵەکە دەگرێ، یان خودی منداڵەکە، چونکە ئەو منداڵەش میرات لە بابی دەگرێ، هەرسێ واتاکەی هەیە.

**مەسەلەی چواردەیەم:** کە دەفەرموێ: ﴿عَن تَرَاضٍ مِّنْهُمَا وَتَشَاوُرٍ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِمَا﴾، مادام ئەو مەسەلەیە بە پێك ڕازی بوونو بەیەکەوە ڕاوێژکردنە، گوناهیان لەسەر نیە، ئایا ئەمە چی لێ وەردەگیرێ ؟ ئەوەی لێ وەردەگیرێ کە خوا ﷻ نەك بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری خێزان، بگرە بۆ سەرپەرشتیکردنی منداڵێك کە دایكو بابی لێك جیابوونەتەوە، وە دەشگونجێ هەر مەبەستی لە ژنو مێرد بێ بە گشتی، با لە یەکیش جیانەبووبنەوە کە هەر بەو شێوە دایك شیر دەدا بە منداڵ، وە باب دەبێ نەفەقەی دایکەکە بکێشێ، بۆ ئەوە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿عَن تَرَاضٍ مِّنْهُمَا وَتَشَاوُرٍ﴾، بە ڕەزامەندیی و ڕاوێژی

هەردووکیان بێ، جا ئایا ئەمە چی لێ وەردەگیرێ؟ ئەوەی لێوەردەگیرێ کە کۆمەڵگاو دەوڵەت ناگونجێ بەڕێوە ببرێ، ئەگەر بە ڕەزامەندیی ئەندامەکانی ئەو کۆمەڵگایەو پێکهاتەکانیو بە ڕاوێژیان نەبێ، واتە: خوا ﷻ دەفەرموێ: دەبێ خێزانێکو ژنو مێردێک پێکەوە ڕەزامەندیی بدەنو پێکەوە ڕاوێژ بکەن، بۆ ئەوەی ئەو منداڵەیان چۆن شیر بدەن ؟ ئەدی وڵاتێکی گەورەو گران بەبێ ڕەزامەندیی پێکهاتەکانی ئەو کۆمەڵگایەو، پێکەوە ڕاوێژکردنیان چۆن بەڕێوەدەبرێ ؟! ئەوەتان بۆیە پێ دەڵێم، چونکە هەندێ خەڵکی نەفامو نەزان دەڵێن: ئیسلام سیستەمی حوکمڕانیی تێدانیەو دیاری نەکردوە کە کۆمەڵگا چۆن بەڕێوە دەچێ ! ئایا (ئیسلام)ێک دیاری کردبێ کە چۆن شیر بدرێ بە منداڵێکو دایکو باوکە چۆن پێکەوە ڕازی بنو لەسەری ڕاوێژ بکەن ! چۆن ئەوەی دیاری نەکردوە کە وڵاتو کۆمەڵگا چۆن بەڕێوە بچێ ؟! هەڵبەتە لە هێڵە گشتییەکانو بنەما سەرەکییەکاندا، نەک لە وردەکارییەکاندا کە شەریعەتی خوای کاربەجێ لە ڕووی حیکمەتو دووربینییەوە باسی نەکردوون[١].

**مەسەلەی پازدەیەمو کۆتایی:** کە دەفەرموێ: ﴿ فَإِنْ أَرَادَا فِصَالًا عَن تَرَاضٍ مِّنْهُمَا وَتَشَاوُرٍ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِمَا ﴾، واتە: ئەگەر لەسەر بناغەی ڕازیبوونی هەردووکیانو ڕاوێژبوونیان بێ، گوناهیان ناگاتێ، کەواتە: ئەگەر بە ڕەزامەندییو بە ڕاوێژیان نەبێ گوناهبار دەبن، یانی: ئەگەر پیاوەکە هەر لە خۆڕا بڵێ: دەبێ هەر وابێو ژنەکە بڵێ: نەخێر واناکەمو دەبێ هەر وابێ، ئەوە گوناهبار دەبن، تەنیا کاتێک تووشی گوناح نابن، کە پێکەوە ڕاوێژ بکەنو پێکەوە ڕازی بنو لەسەری بگەنە ئیتیفاقو پێکهاتن، ئەو کاتە لە گوناح

١) لەوبارەوە سەرنجی کتێبی: ( تەوژمی ئیسلامیی و عەلمانییو خاڵە هاوبەش و جیاوازیەکانیان) چاپی دووەم، بدە، بەڵام لێکۆڵینەوەی تێروتەسەل لەوبارەوە لە زنجیرە وتاری: {ئیسلامو دەوڵەتدارییو حوکمڕانیی} دایە، کە لە کەناڵی ئاسمانی پەیامو بەرنامەی (سەرنج)دا پێشکەش دەکرێنو خوا یاربێ لە دووتوێی کتێبێکیشدا کۆدەکرێنەوە.

دووردەبــن، ئنجـا بەهــەمان شـێوەش وەك باسمــان كــرد، وەك چـۆن بناغـەی بـەڕێوەبردنی خێـزان بـە ڕەزامەنـدیی هەركــام لـە ژنو مێـردو ڕاوێـژكردنی هــەردووك لایــە، بەهــەمان شـێوەش كۆمـەڵگاو دەوڵـەتیش بناغەكـەی بریتیـە لـەوەی كـە پێكهاتــەكانی ڕازیــبنو پێكــبێنو بــە ئیتیفـاق بگـەن، وە پێكـەوە ڕاوێـژبكـەنو بە عەقڵی هەموو لایـەك ئەو وڵاتـە ئیـدارە بكـرێ.

ئەمەش كۆتـایی ئەو دەرسـەمان بـوو، خـوای بەخـشندە لـەو كەسـانەمان بگێـڕێ كە لە هەموو كاروبـاری ژیانیانـدا، لـە كاروبـاری تـاكیی و خێزانیـی و كۆمەڵایـەتیی و سیاسییانـدا، پابەند دەبن بە شـەریعەتی خـوای بەرزو بێوێنـەوەو لەبەر ڕۆشنایی قورئـانو سـوننەتدا بەڕێوە دەچـن، بۆ ئەوەی سەرفرازی دنیاو دوارۆژ بیـن.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی پەنجایەمین

## پێناسـەی ئەم دەرسـە

لەم دەرسەماندا خوا پشتیوان بێت ئایەتەکانی ژمارە: (٢٣٤ تاكو ٢٤٢) واتە نۆ (٩) ئایەت لە سووڕەتی (البقرة) دەتوێژینەوە، لەم نۆ ئایەتەدا خوا ﷻ باسی عیددەی ژنی مێرد مردوو دەكات، وە پاشان باسی ئەوە دەكات كە دروستە ئافرەتێك كە لە عیددەدایە، پیاوێك بەشێوەی دەبەر ڕاهاوێشتن‌و بە شێوەی كینایە تێی بگەیەنێت، كە ڕەغبەتی بۆی هەیە مارەی بكاتەوەو بیهێنێ، وە دوایی باسی تەڵاقدانی ژنانی نەگوازراوەو مارەیی بۆ بڕیار نەدراوو مارەیی بۆ بڕیاردراو دەكات، پاشان باسی پارێزگاریی لێكردنی پێنج نوێژە فەرزەكان بەتایبەت نوێژی نێوەڕاست دەكات، وە باسی نوێژی ترس دەكرێ لەم ئایەتانەدا، وە باسی وەسیەتكردنی مێرد بۆ مانەوەی ژن لە ماڵەكەیدا بۆ ماوەی ساڵێك دوای ئەوەی كە مێردەكەی دەمرێ، وە باسی پێویستبوونی دیارییدان بە ئافرەتێك كە تەڵاق دەدرێ، دەكرێ.

﴿وَٱلَّذِينَ يُتَوَفَّوْنَ مِنكُمْ وَيَذَرُونَ أَزْوَٰجًا يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْرًا ۖ فَإِذَا بَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ فِيمَا فَعَلْنَ فِىٓ أَنفُسِهِنَّ بِٱلْمَعْرُوفِ ۗ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ ﴿٢٣٤﴾ وَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ فِيمَا عَرَّضْتُم بِهِۦ مِنْ خِطْبَةِ ٱلنِّسَآءِ أَوْ أَكْنَنتُمْ فِىٓ أَنفُسِكُمْ ۚ عَلِمَ ٱللَّهُ أَنَّكُمْ سَتَذْكُرُونَهُنَّ وَلَٰكِن لَّا تُوَاعِدُوهُنَّ سِرًّا إِلَّآ أَن تَقُولُوا۟ قَوْلًا مَّعْرُوفًا ۚ وَلَا تَعْزِمُوا۟ عُقْدَةَ ٱلنِّكَاحِ حَتَّىٰ يَبْلُغَ ٱلْكِتَٰبُ أَجَلَهُۥ ۚ وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ مَا فِىٓ أَنفُسِكُمْ فَٱحْذَرُوهُ ۚ وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ حَلِيمٌ ﴿٢٣٥﴾ لَّا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ إِن طَلَّقْتُمُ ٱلنِّسَآءَ مَا لَمْ تَمَسُّوهُنَّ أَوْ تَفْرِضُوا۟ لَهُنَّ فَرِيضَةً ۚ وَمَتِّعُوهُنَّ عَلَى ٱلْمُوسِعِ قَدَرُهُۥ وَعَلَى ٱلْمُقْتِرِ قَدَرُهُۥ مَتَٰعًۢا بِٱلْمَعْرُوفِ ۖ حَقًّا

عَلَى ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٢٣٦﴾ وَإِن طَلَّقْتُمُوهُنَّ مِن قَبْلِ أَن تَمَسُّوهُنَّ وَقَدْ فَرَضْتُمْ لَهُنَّ فَرِيضَةً فَنِصْفُ مَا فَرَضْتُمْ إِلَّآ أَن يَعْفُونَ أَوْ يَعْفُوَا۟ ٱلَّذِى بِيَدِهِۦ عُقْدَةُ ٱلنِّكَاحِ ۚ وَأَن تَعْفُوٓا۟ أَقْرَبُ لِلتَّقْوَىٰ ۚ وَلَا تَنسَوُا۟ ٱلْفَضْلَ بَيْنَكُمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴿٢٣٧﴾ حَـٰفِظُوا۟ عَلَى ٱلصَّلَوَٰتِ وَٱلصَّلَوٰةِ ٱلْوُسْطَىٰ وَقُومُوا۟ لِلَّهِ قَـٰنِتِينَ ﴿٢٣٨﴾ فَإِنْ خِفْتُمْ فَرِجَالًا أَوْ رُكْبَانًا ۖ فَإِذَآ أَمِنتُمْ فَٱذْكُرُوا۟ ٱللَّهَ كَمَا عَلَّمَكُم مَّا لَمْ تَكُونُوا۟ تَعْلَمُونَ ﴿٢٣٩﴾ وَٱلَّذِينَ يُتَوَفَّوْنَ مِنكُمْ وَيَذَرُونَ أَزْوَٰجًا وَصِيَّةً لِّأَزْوَٰجِهِم مَّتَـٰعًا إِلَى ٱلْحَوْلِ غَيْرَ إِخْرَاجٍ ۚ فَإِنْ خَرَجْنَ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ فِى مَا فَعَلْنَ فِىٓ أَنفُسِهِنَّ مِن مَّعْرُوفٍ ۗ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٢٤٠﴾ وَلِلْمُطَلَّقَـٰتِ مَتَـٰعٌۢ بِٱلْمَعْرُوفِ ۖ حَقًّا عَلَى ٱلْمُتَّقِينَ ﴿٢٤١﴾ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمْ ءَايَـٰتِهِۦ لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ﴿٢٤٢﴾﴾.

## مانای وشە بە وشەی ئایەتەکان

((وە ئەوانەتان کە دەمرێنرێن وە هاوسەریان بەجێ دەهێڵن، هاوسەرەکانیان چوار مانگو دە شەو چاوەڕوان دەبنو خۆیان مەرزەم دەکەن، جا هەر کات گەیشتنە کاتی دیارییکراویان، ئەوە هیچتان لەسەرنیە لەوەدا، کە بە شێوەیەکی پەسەند لە خودی خۆیاندا دەیکەن (کە خۆیان بڕازێننەوە بەمەبەستی شووکردنەوە) وە خوا شارەزایە بەوەی دەیکەن ﴿٢٣٤﴾ وە گوناهتان ناگا لەوەدا کە بە ئاماژە خوازبێنی ئافرەتان بکەن، یان لە دڵی خۆتاندا نیازی هێنانیان پەنهان بکەن، خوا زانی کە هەر باسیان دەکەن، بەڵام بە پەنهانیی گفتو بەڵێنیان لەگەڵ مەدەن هیچ قسەیەکیان رامەسپێرێن، مەگەر قسەیەکی ڕەواو باش بکەن، وە هەتا عیددەی پێویستکراو نەگاتە کۆتایی، عەزم لەسەر گرێبەستی هاوسەرگیریی جەزم مەکەن، وە بزانن کە خوا ئەوە دەزانێ کە لە دڵو دەروونتان دایە، دەجا بە لێ ترسانییەوە وریابن، وە بزانن کە خوا

لێبوردەی هێمنە ﴿٢٣٥﴾ هیچتان لەسەرنیە کە ژنان تەڵاق بدەن، مادام دەستتان پێیان نەگەیاندبێ (واتە: نەچووبنە لایان) وە مارەیی پێویستتان بۆیان دیاری نەکردبێ، بەڵام خەڵاتیان بکەن، بابای دەستکراوە بەپێی خۆیو بابای تەنگ دەستیش بەپێی خۆی، دیاریی پێدانێکی بەپێی باوو پەسەند، ئەوە لەسەر چاکەکاران پێویستە ﴿٢٣٦﴾ ئەگەر بەرلەوەی دەستیان بگەیەننێ (واتە: لەگەڵیان جووت بن) تەڵاقتان دانو مارەیی پێویستیشتان بۆیان دانابوو، ئەوە مەگەر ئەوان (واتە: ئافرەتەکان) لەو نیوە مارەییە ببوورن، یان ئەو کەسەی کە گرێبەستی هاوسەرگیریی بەدەستە (واتە: مێردەکە) لەنیوە مارەییەکەی دی ببووڕێ، ئەگەرنا نیوەی ئەو مارەییەی کە داتانناوە، دەیانکەوێ، وە ئەگەر لەمافی خۆشتان ببوورن لە پارێزکارییەوە نزیکترە، وە چاکەی نێوانتان لەبیر مەکەن بێگومان خوا بینەری ئەوەیە کە دەیکەن ﴿٢٣٧﴾ پارێزگاریی لە نوێژان بکەن، وە نوێژی نێوەڕاست بەتایبەت، وە بە گەردنکەچییەوە بۆ خوا بوەستن ﴿٢٣٨﴾ وە ئەگەر ترسان بە پیادەو بە سواریی نوێژەکانتان بکەن، جا هەر کات هێمنبوونەوە، بەو جۆرە کە خوا فێری کردوون، وە نەتاندەزانی یادی خوا بکەن ﴿٢٣٩﴾ وە ئەوانەتان کە دەمرێنرێن وە هاوسەران بەجێ دەهێڵن، با وەسیەت بۆ هاوسەرانیان بکەن، کە بەبێ وەدەرنان، ماوەی ساڵێك شوێنی حەوانەوەو گوزەرانیان دابین بکرێ، جا هەرکات خۆیان دەرچوون، ئەوە ئێوە هیچتان لەسەر نیە، لەوەدا کە بە شێوەکی پەسەند لەبارەی خۆیانەوە دەیکەن، {مادام عیددەی پێویستیان تەواو بووبێ}، وە خوا زاڵی کاربەجێیە ﴿٢٤٠﴾ وە ژنانی تەڵاقدراو هەقی خەڵاتکردنیان هەیە لەسەر پارێزکاران پێویستە ﴿٢٤١﴾ ئاوا خوا ئایەتەکانیتان بۆ ڕوون دەکاتەوە بەڵکو بفامن ﴿٢٤٢﴾)).

## شیکردنەوەی هەندێك لە وشەكان

(**يُتَوَفَّوْنَ**): (الوَافي: الّذي بَلَغَ التّمَامَ، يُقَالُ: دِرْهَمٌ وافٍ، كَيْلٌ وَافٍ، وَأوْفَيْتُ الكَيْلَ والوَزْنَ وَتَوَفَّاهُ بَعْدَ قبض روحه، وَتوَفَّى فُلاَنٌ حَقَّهُ: أخذه وافياً)، واتە: (وَافي) ئەو شتەی كامڵ بووبێ، دەگوترێ: درەمێكی تەواو، پێوانەیەكی تەواو، وە پێوان‌و كێشانم تەواوكردن، وە (توَفَّاه) مراندی، وە فڵانكەس هەقی خۆی بە تەواویی وەرگرت.

(**وَيَذَرُونَ**): واتە: (يَدعُونَ، يَتْرَكُون) واتە بەجێ‌دەهێڵن، لە دوای خۆیان.

(**جُنَاحَ**): واتە: گوناح، لە ئەسڵدا وشەی: (جُناح) لە (جَنَاحَ)ەوە هاتوە، (جَناحْ) واتە: باڵ (جَنَاحِ الطَائِر) واتە: باڵی باڵندە، وە دەگوترێ: (وجَنَحَتِ السَفِينَة: مَالَتْ، و يُسمَّى الإِثْمُ الْمَائِل بالإنسَان جُنَاحَاً)، كەشتییەكە بەلایەكدا كەوت، ئەگەر كەشتی بەلایەكدا كەوت بۆ نغرۆ بوون، كەواتە: ئینسانیش كە تووشی گوناح دەبێت یانی: لایداوە بەلایەكدا، بۆیەش گوناه پێی دەگوترێ: (جُنَاح) چونكە لادانی تێدایە.

(**عَرَّضْتُم**): (التَعْرِيضُ كَلاَمٌ لَهُ وَجْهَانِ مِنَ صدقٍ و كَذبٍ أو ظَاهِرٍو باطِنٍ، عرّضَ أشارَوألمَحَ، والتَعْرِيضُ: أنْ تُفْهِمَ المخاطَبَ المقصودَ بلَفْظٍ لَمْ يوضَعْ لَهُ صَرَاحَةً بَلْ تلويحاً وَ إشَارَةً)، واتە: (تَعْرِيض) لە كوردەواریی خۆماندا پێی دەڵێن: دەبەر ڕاهاوێشتن، ئەوەیە كابرا ئەو قسەیەی كە دەیكات دوو ڕووی هەبن، ڕاستیش هەڵبگرێ‌و درۆش، یاخود پەنهانیشی هەبێ‌و ئاشكراشی هەبێت، وە (عَرّضَ) واتە: ئاماژەی پێداو ئیشارەتی پێدا، (تَعْرِيض)یش ئەوەیە كە تۆ بابای دوێنراو حاڵی بكەی بە وشەیەك، كە مانایەكی پەنهانی هەبێ، وە مانا ڕواڵەتەكە بۆ ئەوە دانەنرابێ، بەڵكو بەس بە ئاماژەو هێمابێ.

(خِطْبَةِ): ئێمە وشەی: (خُطْبَة)مان هەیە، واتە: وتار، وە وشەی: (خِطْبَة)مان هەیە، واتە: خوازبێنی، یانی: ئەو قسەیەی کە دەکرێ بۆ داواکردنی ئافرەت. وشەی (الخَطْبُ: الأمْرُ العَظيمُ الّذي يَكثُرُ فيهِ التَخاطُبُ)، واتە: ئیشێکی گەورە، هەر ئیشێك کە قسەی زۆر تێدابێ، وە (خَطِيبْ وخَاطِبْ) بۆ هەرکام لە (خِطبة و خُطبة) دەبنو (خِطبَة) بۆ داواکردنی ئافرەتەو (خُطبة) بۆ ئامۆژگارییکردنە، وە بە بکەری هەردووکیشیان دەگوترێ: (خَطِيب و خاطِب) بەڵام وشەی (خَطِيب) زیاتر بۆ وتار بێژە، وە وشەی (خاطِب)یش زیاتر بۆ خوازبێنیکەرە.

(سِرًّا ): واتە: پەنهان، (الإسْرَارُ: خِلافُ الإعْلانِ وَكُنّي عن النِّكَاح بالسِّر)، واتە: پەنهان کردن پێچەوانەی ئاشکرا کردنە، وە وشەی (سِرّ) کینایەو ئاماژەیە بۆ هاوسەرگیری (والسِّرِ: هُوَ الحَدِيث المُكَتَّمُ في النَّفْسِ) وشەی (سِرّ): بریتیە لە قسەیەك کە خاوەنەکەی لە دڵی خۆیدا دەیشارێتەوە.

(عُقْدَةَ ): واتە: گرێ (نِكَاح)یش واتە: هاوسەرگیریی، کەواتە: (عقدة النِّكاح) واتە: گرێبەستی هاوسەرگیریی، ئەسڵی وشەی (عُقْدَةَ)، واتە: گرێدان، دەڵێ: (العَقْدُ: الجَمْعُ بَيْنَ أطْرَافِ الشَّيء، ويُسْتَعْمَلُ ذَلِكَ في الأجْسَامِ الصُّلْبَةِ كَعَقْدِ الحَبْلِ ثُمَّ يُسْتَعَارُ ذَلِكَ لِلْمَعَاني نحوُ: عَقْدِ البَيْعِ، والعَهْدِ، والنِّكاح) (عَقْد): بریتیە لەوە کە شتێك تەرەفەکانی کۆبکەیەوە، داوە پەتێك هەردوو سەرەکەی کۆدەکەیەوەو گرێ دەدەی، بەڵام خوازراوەتەوە بۆ شتی مەعنەوییش، وەك گرێبەستی کڕینو فرۆشتن، وە گرێبەستی پەیمان، وە گرێبەستی مارەکردن.

(فَاحْذَرُوهُ ): (الحذرُ: احترازٌ مِن مخيف)، وشەی (حَذَر) خۆ پاراستنە لە شتێکە کە جێی مەترسی بێ، (فاحْذَرُوهُ)، واتە: بە وریاییەوە خۆتان دووربگرن لەوەی کە خوا لە خۆتان تووڕە بکەن.

**(حَلِيمٌ):** واتە: هێدیی، (الْحِلْمُ: ضَبْطُ النَّفْسِ والطَّبْعِ عَنْ هَيجَانِ الغَضَبِ وَجَمعهُ: أحْلام، وَسُمِيَ بِهِ العَقْلُ لأَنهُ مِنْ مُسَبِّبَاتِ العَقْلِ)، وشەی (حِلْم): بریتیە لە خۆ کۆنترۆڵ کردنو خۆ مەرزەمکردنی سروشتیی، لە کاتی هەڵچوونو توڕەبووندا، کۆیەکەشی بریتیە لە (أحلام) بۆیە عەقڵ پێی دەگوترێ: (حِلْم): (فإذا بَلَغَ الأطفالُ مِنكُم الحُلُم)، چونکە عەقڵ دەبێتە هۆی پەیدابوونی هێدییو مەندیی.

**(تَمَسُّوهُنَّ):** (الْمَسُّ كَاللَّمْسِ، وَكُنِّيَ بِهِ عَنِ الجِمَاعِ) وشەی (تَمَسُّوهُنَّ)، واتە: دەستتان لێدابن (كِنَايَة)یە بۆ جووتبوون، هەمیشە خوای پەروەردگار کە باسی پێکەوە جووتبوونی ژنو مێرد دەکات، لە قورئاندا بە کینایە دەیفەرموێ، بۆ وێنە وشەی (وَطء) بەکاردەهێنێ، وشەی (مَسّ) بەکاردەهێنێ، وشەی (لامَستُم) بەکاردەهێنێ، کە بەمانای: پێی لێنان، دەستلێدان، دەست پێکەیاندت، دێن، وە وشەی (جِماع)یش بەخۆی لەخۆیدا واتە: جووتبوون، ئەویش هەر (كِنَايَة)یەو ئاشکرا نیە.

**(فَرِيضَةً):** (الفَرْضُ: قَطْعُ الشَّيءِ الصَّلْبِ وَالتأْثِيرُ فيهِ، ﴿أَوْ تَفْرِضُواْ لَهُنَّ فَرِيضَةً﴾، أي سَمَّيتُمْ لَهُنَّ مَهْرًا) (فَرْض) واتە: (قَطْع) شتێکی ڕەق کە ببڕدرێو کاری تێبکرێ، دەگوترێ (فَرَضَ، فَرِيضَةً) شتێك کە پێویست کرابێ، وەك بڵێی ئەو مافە بۆ وی پێویست کراوەو بڕاوە لەوەی کە پێویست نیە.

**(الْمُوسِعِ):** (أوْسَعَ فلانٌ: كَثُرَ مالُهُ وَصَارَ ذا سَعَةٍ وغِنَى فَهُوَ مُوسِعٌ)، واتە: (موسِع) کەسێکە دەست کراوەیەو سەروەتو سامانی فراوانی هەیە، دەگوترێ: (أوْسَعَ فلانٌ) واتە: ماڵو سامانی زۆر بوو، یاخود دەستی کراوە بووو بێنیاز بوو.

**(ٱلۡمُقۡتِرِ)**: (القَتْرُ: تَقْلِيلُ النَّفَقَةِ، وقَتَرْتُ الشَّيءَ وأقْتَرْتُهُ وَقتَّرْته، أي: قَلَّلْتُهُ) وشەی (قَتْرُ) واتە: کەمکردنەوەی نەفەقە، دەگوترێ: (قَتَرْتُ الشَّيءَ وأقْتَرْتُهُ وَقتَّرْتهُ، أي: قَلَّلْتُهُ) واتە: کەمم کردەوە، (المُقْتِرِ): کەسێکە ماڵی کەم هەیە، تەنگ دەستە.

**(مَتَٰعًاۢ)**: کە لە قورئاندا ئەم وشەیە زۆر بەکارهاتوە، (المَتَاعُ: انْتِفَاعٌ مُمْتَدٌّ الوَقْتِ، ويُقَالُ لِمَا يُنْتَفَعُ بِهِ في البَيْتِ: مَتَاعٌ، وكُلُّ ما يُنْتَفَعُ بِهِ فَهُوَ مَتَاعٌ)، وشەی (مَتَاعُ) هەرشتێکە کە لێی بەهرەمەندبی، بۆیە کەلوپەل‌و شمەك کە بۆ ماوەیەکی دیاریکراو لێی بەهرەمەندبی، لە ماڵدا (مَتَاع)ی پێدەگوترێ.

**(ٱلۡفَضۡلَ)**: (الفَضْلُ: الزِّيَادَةُ مِنْ حَيْثُ الجِنْسُ، أو النَّوْعُ أو الذَّاتُ) وشەی (فضلُ) بریتیە لە زێدەیی لەڕووی ڕەگەز، یان جۆر، یان خودەوە.

**(حَٰفِظُواْ)**: (أي: تَعَهَّدُوا ورَاعُوا)، واتە: پارێزگاریی لێ بکەن، ئاگاتان لێ بێ.

**(ٱلۡوُسۡطَىٰ)**: (الفُضْلَى مِنَ الوَسَط، وهو مالَهُ طَرَفَانِ مَذْمُومَانِ)، وشەی (فُضْلَى)، واتە: زۆر چاك، بۆچی؟ چونکە (وَسَط) ئەملاولای خراپن‌و نێوە ڕاستەکەی باشە، بۆ وێنە سەخاوەت: ئەولای چرووکیی یە ئەولاشی زێدەڕۆیی‌و دەست بڵاوییەو، نێوەڕاستەکەیان سەخاوەتە، ئازایەتی: ئەولای ترسنۆکیی یەو ئەولاشی خۆپێدادان‌و بەبێ حیساب چوونە پێشە، نێوە ڕاستەکەیان ئازایەتییە، وە هەروەها زۆربەی سیفەتە چاکەکان[1]، لایەکیان تێپەڕاندنەو لایەکیان بەزایەدانەو نێوە ڕاستەکەشیان چاکە، بۆیە خوا بە ئۆممەتی پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ﴿ وَكَذَٰلِكَ جَعَلۡنَٰكُمۡ أُمَّةٗ وَسَطٗا ...﴿١٤٣﴾ ﴾ البقرة، چونکە هەمیشە خەتی نێوەڕاست چاکە، بەو لادا لابدەی خراپەو بەولاشدا هەر خراپە، هەروەها خوا ﷻ بەرنامەی خۆی بە (الصِرَاطُ المُسْتَقِيم) ڕێگای ڕاست مەدح کردوە.

---

١) بۆیە گوتوومانە: (زۆربە)، چونکە هەندێك لە سیفەتەکان وانین، بۆ نموونە: دادگەریی، زانیاریی‌و شارەزایی، لێزانیی... .

(قَـٰنِتِينَ ): واتــە: بــە ملكەچـیی، کـۆی (قانِـت)ە، ئـەویش لــە (قنـوت)ەوە هــاتوە. (القُنُوتُ: لُـزُومُ الطَّـاعَـةِ مَـعَ الخُـضُوعِ، فالقَانِـتُ هُـوَ الخَاضِـعُ أَو الطَّـائِعُ أَو السَّاكِن)، وشەی (قُنُوت): بریتیە لە بەردەوامیی لەسەر فەرمانبەریی لەگەڵ ملکەچیی، واتە: لە دەروونەوەو لە ناخەوە ملکەچ بێ، کەواتە: (قانِت) بریتیە لە ملکەچ، یان فەرمانبەر، یان بێدەنگ، کە دەفەرموێ: ﴿ وَقُومُواْ لِلَّهِ قَـٰنِتِينَ ﴾، واتە: بە ملکەچیی، یــان بەبێ دەنگیی ڕابوەستن.

(وَصِيَّةً): لــە کــوردەواریی خۆمانــدا ڕاســپاردن، یــان زۆرجــار وەسیەتیــشی بــۆ بەکاردێ، دەڵێ وەسیەتی بۆ کرد، (الوَصِيَّةُ: التَّقَـدُّمُ إلَـى الغَيْـرِ بِمَا يَعْمَـلُ بِهِ مُقْتَرِنـاً بِوَعْـظٍ)، وشــەی (وصـیة): بریتیـــە لــەوەی کــە تــۆ قــسەیەك بــۆ کەسێك بکــەیو ئامۆژگارییــەکی بکــەی کــە کــاری پێ بکــات.

## هــۆی هاتنـــە خوارەوەی ئایەتەکـــان

١) هــۆی هاتنـــە خـــواری ئــەم ئایەتــە، کــە دەفــەرموێ: ﴿ حَـٰفِظُواْ عَلَى ٱلصَّلَوَٰتِ وَٱلصَّلَوٰةِ ٱلْوُسْطَىٰ وَقُومُواْ لِلَّهِ قَـٰنِتِينَ ﴾، {(عَنْ أَبِي عَمْرٍو الشَّيْبَانِيِّ، عَنْ زَيْدِ بْنِ أَرْقَمَ ﷺ، قَالَ: كُنَّا نَتَكَلَّمُ فِي الصَّلاَةِ، يُكَلِّمُ أَحَدُنَا أَخَاهُ فِي حَاجَتِهِ حَتَّـى نَزَلَـتْ هَــذِهِ الآيَــة: ﴿ وَقُومُواْ لِلَّهِ قَـٰنِتِينَ ﴾، وَأُمِرْنَـا بِالـسُّكُوتِ) (رَوَاهُ البُخَارِيُّ، بـرقم: (١٢٠٠) بِهَذَا اللَّفْظ، وَمُسلم بـرقم: (١٢٠٣)، وَأَبُو دَاوُدَ بـرقم: (٩٤٩)، وَالتِّرمِذِيّ برقم: (٤٠٥)، وَالنَّسَائِيُّ بـرقم: (١٢١٨)}، واتــە: زەیـدی کـوڕی ئـەرقـەم (کە یەکێکە لــە هــاوەڵان) خـوا لــێی ڕازی بــێ، دەڵــێ: ئێمــە عــادەتمان وابــوو لــە نوێــژدا لەگــەڵ یەکــدی قــسەمان دەکــرد، یەکــێك لــە ئێمــە لەگــەڵ برایەکەی قسەی دەکرد ئیشێکی پێبایە دەدواند، هەتا ئـەم ئایەتـە هاتـە خـوارێ: ﴿ حَـٰفِظُواْ عَلَى ٱلصَّلَوَٰتِ وَٱلصَّلَوٰةِ ٱلْوُسْطَىٰ وَقُومُواْ لِلَّهِ قَـٰنِتِينَ ﴾، واتـــــــە:

پارێزگاریی لە نوێژەکانتان بکەن، وە نوێژی نێوەڕاست بەتایبەت، وە بۆ خوا بە ملکەچیی‌و بێ دەنگ ڕابوەستن.

٢) هۆی هاتنە خواری ئەم ڕستەیە، کە دەفەرموێ: ﴿ وَلِلْمُطَلَّقَاتِ مَتَاعٌ بِالْمَعْرُوفِ حَقًّا عَلَى الْمُتَّقِينَ ﴾، {(قَالَ عَبدُالرحمن بنِ زَيدِ بنِ أسلَم لَمَّا نَزَلَ قَولُهُ تَعَالى: ﴿ مَتَاعًا بِالْمَعْرُوفِ حَقًّا عَلَى الْمُحْسِنِينَ ﴾، {كە لە ئایەتەکی پێشتر دایەو دەفەرموێ: دیاریی بدەن بەو ئافرەتانەی کە تەڵاقیان دەدەن، ئەوە هەقێکە لەسەر چاکەکاران، کاتێك ئەوە هاتە خوارێ} {(قَالَ رَجُلٌ: إنْ شِئْتُ أَحْسَنْتُ فَفَعَلتُ، وَإِنْ شِئْتُ لَمْ أَفعَل، فَأَنْزَلَ اللهُ هَذِهِ الآيةَ: ﴿ وَلِلْمُطَلَّقَاتِ مَتَاعٌ بِالْمَعْرُوفِ حَقًّا عَلَى الْمُتَّقِينَ ﴾)، (أخرَجَهُ ابنُ جَرِير)}[1]، واتە: عەبدوڕڕەحمانی کوڕی زەیدی کوڕی ئەسلەم دەڵێ: دوای ئەوەی ئەم ئایەتەی پێشتر هاتە خوارێ، کە دەفەرموێ: ئەگەر دیاری بدەن بەو ئافرەتانەی کە تەڵاقیان دەدەن، ئەوە مافێکە لەسەر چاکەکاران، پیاوێك گوتی: جا ئەگەر ویستم چاکە بکەم ئەوە دیاریی پێدەدەم، ئەگەر نەشمویست چاکەی لەگەڵدا نەکەم پێی نادەم، خوا ئەم ڕستەیەی ناردە خوارێ کە دەفەرموێ: ئەوە هەقێکە لەسەر پارێزکاران، {واتە: ئەگەر دەتانەوێ ئەهلی تەقوا بن، پێویستە دیارییان پێ بدەن، کەواتە: ئەگەر ڕستەکەی پێشێ ئەوەی لێ بفامرێتەوە، کە سوننەتە، ئەمەیان ئەوەی لێ دەفامرێتەوە کە واجبە}.

## مانـــای گشــتی ئایەتەکـــان

خوا ﷻ لەسەر ڕوونکردنەوە یاساو ئەدەبە شەرعییەکانی بواری خێزان‌و باری کەسێتی‌و ڕاستگردنەوەی بیروبۆچوون‌و ڕەفتارە هەڵەو ناتەواوەکانی ئەو بوارە گرنگ‌و هەستیارە، بەردەوامەو ڕوو لە کۆمەڵگای مسوڵمان‌و لە خەڵکی مسوڵمان

١) (المِصْبَاحُ المنير...)، ص: (١٨٧)، وە (فتحُ القَدِير) للشَوكاني، ج: (١)، ص (٣٣٨).

دەکـات، دەفـەرموێ: ﴿ وَٱلَّذِينَ يُتَوَفَّوْنَ مِنكُمْ وَيَذَرُونَ أَزْوَٰجًا ﴾، وە ئەوانـەتان کـە دەمرێنرێن، بۆ دەفەرموێ: ﴿ يُتَوَفَّوْنَ ﴾ ؟ چونکـە ئینسان خۆ بەدەست خـۆی نیـە بمـرێ، وانیـە ! دەمرێنـرێ، ئەوانـەتان کـە دەمرێنـرێنو گیانیـان دەکێـشرێ، وە لـە دوای خۆیان هاوسەران بەجێدەهێڵن، جا لەزمانی عەرەبیـدا، وشەی: (أَزْوَاج)، واتە: هاوسەران هەم بۆ پیاو بـەکاردێو هـەم بـۆ ئـافرەت، وە لـە هـەموو قورئانـدا خـوای زانـاو شـارەزا وشـەی: (زَوجَـة)ی بـۆ ئـافرەت بەکارنـەهێناوەو، هـەر وشـەی: (زَوْج)ی بەکارهێنـاوە، بۆ وێنە: ﴿ وَقُلْنَا يَـٰٓـَٔادَمُ ٱسْكُنْ أَنتَ وَزَوْجُكَ ٱلْجَنَّةَ ﴿٣٥﴾ ﴾ البقرة، چـونکە (زَوْج)، واتـە: جـووت، بۆیـە هـەم بـۆ پیـاو بـەکاردێو هـەم بـۆ ئـافرەت، وە بـەپێی سیاقـەکە دیارە کە مەبەست پێی کامیانە، ئنجا خوا ﷻ دەفـەرموێ: ئەوانـەتان کە دەمرێنرێن، لە دوای خۆیان هاوسەران بەجێ دەهێڵـن (هاوسـەرەکان چـی دەکـەن؟) ﴿ يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْرًا ﴾، دەبـێ چاوەڕێی خۆیـان بکـەنو خۆیـان مەرزەم بکەن چوارمانگو دە شەو، واتە: نابێ چاویان لـە مێردکردنـەوە بـێ، هـەتا چـوارمانـگو دە شـەو تێنەپـەڕێ بەسـەر کۆچـی دوایـی مێردەکانیانـدا ﴿ فَإِذَا بَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ ﴾، جا ئەگەر گەیشتنە کاتی دیاریکراویی خۆیـان، واتـە: گەیـشتنە کۆتـایی کاتەکـەو مـاوەی چـوار مـانگو دە شـەو تێپـەڕی ﴿ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ فِيمَا فَعَلْنَ فِىٓ أَنفُسِهِنَّ بِٱلْمَعْرُوفِ ﴾، ئێوە ئەی کۆمەڵگای مسوڵمان، یـان ئـەی خـزمو کەسوکـاری ئافرەتەکە! ئەو بێوەژنانە ئەگەر لە زاتی خۆیانـدا بـە شێوەیەکی پەسـەند خۆیـان جوان بکـەن، یان پۆشـاکێکی جوان لەبەر بکەن، ئێوە گوناهتـان ناگـاتێو ئـەوانیش هـەقی خۆیانـە، واتـە: هـەتا چـوار مـانگو دە شـەو بێـوەژن نابـێ خـۆی بۆنـخۆش بکـاتو، نـابێ بەرگی ڕازاوە لەبەر بکات، کە سەرنجی پیاوان ڕابکێشێ، بەڵکو دەبـێ تازیەبارییو ماتەمینیی پێوە دیاربێ، بەڵام دوای ئەوە گوناهبار نیە، نـە بەخـۆی گونـاهبـارەو، کەسوکـاریشیو کۆمەڵگاش بۆیان نیـە ڕێی لـێ بگرن، جـا ئـایا بۆچـی وای فەرمووە؟ چونکە لە سەردەمی نەفامییـدا وابووە کـە ماوەیەکی زۆر ئـافرەتـان

بۆیان نەبووە، ساڵێك دوو ساڵ، یان ئێستا لەنێو هەندێك تیرەو هۆزدا هەر عەیبە ئافرەت کە مێردی مرد، شوو بکاتەوە، ئەوەش هەمووی عادەتو نەریتی نەفامییەو هیچ پەیوەندیی بە ئیسلامەوە نیە ﴿ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ ﴾، وە خوا بەوەی دەیکەن شارەزایە، دەزانێ چی دەکەنو چۆن دەکەن ! ئەوجار دێتە سەر بابەتێکی دی، دوای ئەوەی کە باسی عیددەی کرد ئەو کاتەی کە دەبێ ئافرەت بیگوزەرێنێ دوای ئەوەی کە تەلاق دراوە، یان دوای ئەوەی کە مێردی مردوە، کە لێرەدا باسی مێرد مردنە، دوای ئەوە باسی ئەوەی کرد، کە دیارە ئایەتەکانی قورئان هەموویان ڕێزبەندیی مەنتیقییان هەیە، دوایی باسی خوازبێنیو خواستنی بێوەژن دێتە پێشێ، بۆیە دەفەرموێ: ﴿ وَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ فِيمَا عَرَّضْتُم بِهِۦ مِنْ خِطْبَةِ ٱلنِّسَآءِ أَوْ أَكْنَنتُمْ فِىٓ أَنفُسِكُمْ ﴾، ئێوە ئەی پیاوەکان ! گوناهتان ناگاتێ لەوەدا کە بە شێوەی دەبەر ڕاهاێشتن {بە شێوەی ئاماژە پێکردن} خوازبێنیی ئافرەتان بکەن، یاخود لە دڵی خۆتاندا پەنهانی بکەن {نیازتان لەدڵدا هەبێ، کە فلان ئافرەت کە مێردی شەهید بووە، کوژراوە، مردوە، لە دڵی خۆتانی بگرن دوای ئەوە کە عیددەی بەسەرچوو، بچن خوازبێنیی بکەن، گوناهتان ناگاتێ، بەلام نابێ ئاشکرابێ ئاماژە چۆن؟ بۆ وێنە: کابرا دەچێ بۆلای سەرەخۆشیی لێ دەکات، یان ئەگەر بینی دوای دوو سێ مانگ پێی دەڵێ: تۆ ئافرەتێکی باشی ! ڕەنگە زۆر کەس هەبێت پێی خۆش بێت تۆ بخوازێ، بەلام کابرا نابێ باسی خۆی بکات}، ﴿ عَلِمَ ٱللَّهُ أَنَّكُمْ سَتَذْكُرُونَهُنَّ ﴾، خوا زانی ئێوە هەرباسیان دەکەن، جا هەڵبەتە لێرەدا ئایەتەکە گشتی یە، هەرچەندە بەپێی سیاقەکە مەبەست پێی ئافرەتانی مێرد مردووو بێوەژنە، ئەگەرنا لێرەدا بەگشتی خوا ﷻ فەرموویەتی، بەلام بۆیە وا گوتراوە، چونکە کاتێ کە ئافرەت لە عیددەدا دەبێ دروست نیە بەڕاشکاویی پێی بڵێی، بەلام کە لە عیددەدا نەبوو دروستە نەفەرێکی لێ ڕاسپێری بەئاشکراش پێی بڵێ، لەوەوە گوتوویانە مەبەست پێی ئافرەتانی بێوەژنە، ئەگەرنا بۆ ئافرەتانی دیکەش هەر ڕەنگە وا ڕێکتربێ کە بە لەبەر ڕاهاوێشتن (تَعريض)و بە ئاماژە

(كِناية) بگوترێ، نەك بە ڕوون و ڕاشكاویی، جا خوا دەفەرموێ: خوا زانی كە ئێوە هەر باسیان دەكەن ﴿وَلَٰكِن لَّا تُوَاعِدُوهُنَّ سِرًّا﴾، بەڵام بە پەنهانیی گفت و بەڵێنیان لەگەڵ مەكەن، وەك ئەوە كە بڵێ: دەبێ هەر بتخوازم، یان نابێ شوو بە كەسی دیكە بكەی...هتد، ﴿إِلَّآ أَن تَقُولُواْ قَوْلًا مَّعْرُوفًا﴾، مەگەر قسەیەكی باش و پەسەندیان لەگەڵدا بكەن، واتە: قسەیەك كە نەچێتە قاڵبی خواستن و داواكردن و ئەوانەوە، ئەگەر دڵدانەوە بێ سەرەخۆشی بێ قەیناكات، ﴿وَلَا تَعْزِمُواْ عُقْدَةَ ٱلنِّكَاحِ حَتَّىٰ يَبْلُغَ ٱلْكِتَٰبُ أَجَلَهُۥ﴾، وە گرێبەستی هاوسەرگیریی لە دڵی خۆتاندا بڕیاری تەواویی لەسەر مەدەن، تاكو كاتە دیاری كراوەكە، دەگاتە كۆتایی، یانی: تا عیددەیان بەسەردەچێ، (عَزَمَ) واتە: دڵی لەسەر شتێك ساغ كردەوەو بڕیاری لەسەردا، ﴿وَٱعْلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ مَا فِىٓ أَنفُسِكُمْ فَٱحْذَرُوهُ﴾، وە بزانن كە خوا دەزانێ چ لە دەروونتاندا هەیە، بۆیە بە ترسانەوە لێی وریابن، ﴿وَٱعْلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ حَلِيمٌ﴾، وە بزانن كە خوا لێبوردەیەو هێدیی و مەندیشە، زوو سزای بەندەكانی نادات.

ئنجا دێتە سەر بابەتێكی دی، ئەویش ئەوەیە كە ئافرەتێك تەڵاق درابێ، بەڵام نەگوازرابێتەوەو مارەیشی بۆ دیاری نەكرابێ، یاخود ئافرەتێك كە نەگوازرابێتەوە، بەڵام مارەیی بۆ دیاری كرابێ، ئەوانە دەبێت چۆنیان مامەڵە لەگەڵدا بكرێ؟ دەفەرموێ: ﴿لَّا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ إِن طَلَّقْتُمُ ٱلنِّسَآءَ مَا لَمْ تَمَسُّوهُنَّ أَوْ تَفْرِضُواْ لَهُنَّ فَرِيضَةً﴾، گوناهتان ناگاتێ كە ئافرەتان تەڵاق بدەن، بەمەرجێك كە نەتانگواستبنەوەو دەستتان لێ نەدابن، یاخود مارەییشتان بۆ دیاری نەكردبن، بۆ وێنە: كابرایەك خوشكی خۆی یان كچی خۆی دەداتە یەكێك و دەڵێ: ئەوە لێم مارەكردی بە شاهێدی ئەو شاهێدانە، بەڵام ناڵێ لەسەر چەند، ئنجا كە جارێ نەشیگواستۆتەوەو مارەییشی بۆ دیاری نەكراوە، كابرا لەبەر هەر هۆیەك بێ دەیەوێ تەڵاقی بدات، خوا ﷻ دەفەرموێ لەو حاڵەتەدا گوناهتان ناگاتێ تەڵاقی بدەن، ﴿وَمَتِّعُوهُنَّ عَلَى

ٱلْمُوسِعِ قَدَرُهُۥ وَعَلَى ٱلْمُقْتِرِ قَدَرُهُۥ ﴾، بەڵام دیارییان پێبدەنو سەروخەڵاتیان بدەنێ، ئەوەی دەستی کراوەیە لە قەدەر خۆی، وە ئەوەی تەنگ دەستە لە قەدەر خۆی ﴿ مَتَٰعًا بِٱلْمَعْرُوفِ ﴾، بە شێوەیەك كە بە پێی عورفو باو لێی بوەشێتەوەو پەسەندبێ، ئایا ئەوە بۆ چییە؟ بۆ دڵدانەوەی ئەو ئافرەتەو بۆ ئەوەی دڵی نەشكێو كەسیش نەتوانێ قسەو قسەلۆكی بەدوادا بكات، ﴿ حَقًّا عَلَى ٱلْمُحْسِنِينَ ﴾، ئەوە هەقێكە لەسەر چاكەكاران، جا ئەگەر هەندێك وای لێ حاڵی بووبن، كە دیاری پێدانی پیاو بۆ ئەو جۆرە هاوسەرە، تەنیا شتێكی پەسندەو فەرزنیە، چونكە خوا باسی چاكەكاری كردوەو چاكەكردنیش سوننەتە، دەڵێین: وانیە، چونكە مسوڵمان هەر دەبێ (مُحسِن) بێ، خۆ نابێ (مُسيء) بێ، چاكەكار پێچەوانەكەی چییە ؟ خراپەكارە، دیارە ئەگەر خراپەكاربی، خوا سزات دەدات، كەواتە: ئەم ئایەتەش هەر ئەوەی لێ وەردەگیرێ كە لەسەر پیاو پێویستە، هەركات دەستی لە ئافرەتێك هەڵگرت كە هێشتا نەیگواستۆتەوە، دیاریی‌و خەڵاتێكی بداتێ، چونكە مرۆڤ ئەگەر چاكەكار نەبێ مانای وایە خراپەكارەو خراپەكاریش سزای هەیە، وەك چۆن چاكەكار پاداشتی هەیە.

ئنجا دێتە سەر حاڵەتی دووەم كە كابرا هاوسەرەكەی تەڵاق دەداو مارەیشی بۆ دیاری كردوە، بەڵام نەیگواستۆتەوە: ﴿ وَإِن طَلَّقْتُمُوهُنَّ مِن قَبْلِ أَن تَمَسُّوهُنَّ وَقَدْ فَرَضْتُمْ لَهُنَّ فَرِيضَةً فَنِصْفُ مَا فَرَضْتُمْ إِلَّآ أَن يَعْفُونَ أَوْ يَعْفُوَا۟ ٱلَّذِى بِيَدِهِۦ عُقْدَةُ ٱلنِّكَاحِ ﴾، وە ئەگەر تەڵاقتاندان پێش ئەوەی دەستیان بگەیەننێ، {واتە: پێش ئەوەی بیانگوازنەوەو بچنەلایان} وە مارەیی پێویستیشتان بۆ دیاری كردبوون، {بۆچی ناوی لە مارەیی ناوە: (فَرِيضَة)؟ چونكە فەرزە لەسەر پیاو مارەیی بدات بە ئافرەت} لەو حاڵەتەدا ﴿ فَنِصْفُ مَا فَرَضْتُمْ ﴾، دەبێ نیوەی ئەو مارەییەی كە بۆتان پێویست كردوون لەسەر خۆتان بیاندەنێ ﴿ إِلَّآ أَن يَعْفُونَ ﴾، مەگەر ئەو ئافرەتانە لە نیوەی مارەییەكەی خۆیان بتانبوورنو گەردنتان ئازاد بكەن ﴿ أَوْ

﴿ يَعْفُوَاْ ٱلَّذِى بِيَدِهِۦ عُقْدَةُ ٱلنِّكَاحِ ﴾، یاخود ئەوەی گرێبەستی هاوسەرگیرییەکەی بەدەستە، لە نیوەی دووەم ببووریّو مارەییەکەی بەتەواویی بداتێ، واتە: یان دەبێ ئافرەتەکە لە نیوەکەی ببووریّ کە هەقیەتی، یان دەبێ پیاوەکە بڵێ: ئەو نیوەیەی دیکەش هەر بۆ تۆ بێ ﴿ وَأَن تَعْفُوٓاْ أَقْرَبُ لِلتَّقْوَىٰ ﴾، وە ئەگەر لە یەکدی ببوورن لە پارێزکارییەوە نزیکترە، چ ئافرەتەکە پیاوەکە عەفوو بکات مادام نەیگواستۆتەوە، بڵێ: ئەوە لە مارەییەکەم تۆم بەخشی، یان پیاوەکە جوامێریی بکاتو بڵێ: ئەوە من مارەییەکەت بەتەواویی دەدەمێ، ﴿ وَلَا تَنسَوُاْ ٱلْفَضْلَ بَيْنَكُمْ ﴾، وە چاکەی نێوان خۆتان لەبیر نەچێ کە لەگەڵ یەکدیدا چاکە بکەن، ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴾، بێگومان خوا بینەری ئەوە کە دەیکەن دەیبینێو هەموو شتێکی لەبەرچاوە.

ئنجا خوای بەخشەر دێتە سەر باسی نوێژو دەفەرموێ: ﴿ حَـٰفِظُواْ عَلَى ٱلصَّلَوَٰتِ وَٱلصَّلَوٰةِ ٱلْوُسْطَىٰ ﴾، پارێزگاریی بکەن لە نوێژەکانتان، وە نوێژی نێوەڕاست پارێزگاریی لێ بکەن ﴿ وَقُومُواْ لِلَّهِ قَـٰنِتِينَ ﴾، وە بۆ خوا بە ملکەچیی بە بێدەنگیی ڕابوەستن {واتە: لە نوێژێدا قسان مەکەن،ئاوڕ مەدەنەوە، جموجۆڵی ناپێویست مەکەن، وە لە حاڵەتی ئاساییدا نوێژەکانتان بکەن، لە کاتی خۆیداو بەو شێوەیەی کە شەریعەت دیاری کردوە} ﴿ فَإِنْ خِفْتُمْ ﴾، ئەگەر ترسان {واتە: کەوتنە حاڵەتی ترسەوە} ﴿ فَرِجَالًا أَوْ رُكْبَانًا ﴾، چ بەپێوە، نوێژەکانتان بکەن، یان بە سواریی {(رِجَال) کۆی (راجِل)ە، واتە: پێڕۆ، پیادە، بە پیادەیی نوێژەکانتان بکەن، یاخود بە سواریی، چونکە حاڵەتی نائاسایی نوێژی نائاسایی تێدا دەکرێو حاڵەتی ئاساییش بە شێوەی ئاسایی نوێژ تێدا دەکرێ} ﴿ فَإِذَآ أَمِنتُمْ فَٱذْكُرُواْ ٱللَّهَ كَمَا عَلَّمَكُم مَّا لَمْ تَكُونُواْ تَعْلَمُونَ ﴾، جا ئەگەر هێمن بوونەوەو

دڵنیابوونەوە {ترسان لەسەر نەما}یادی خوا بکەن، وەك چۆن فێری کردوون شتێك کە نەتاندەزانی، بەو شێوەیە نوێژ بکەن کە خوا فێری کردوون لە حاڵەتی ئاساییدا نوێژەکانتان بە شێوەی ئاسایی بکەن.

ئنجا دووبارە دێتەوە سەر مەسەلەی عیددەی ئافرەتێك کە مێردی دەمرێ، دەفەرموێ: ﴿ وَٱلَّذِينَ يُتَوَفَّوۡنَ مِنكُمۡ وَيَذَرُونَ أَزۡوَٰجٗا وَصِيَّةٗ لِّأَزۡوَٰجِهِم مَّتَٰعًا إِلَى ٱلۡحَوۡلِ غَيۡرَ إِخۡرَاجٖ ﴾، وە ئەوانەتان کە دەمرێنرێن‌و لە دوای خۆیان هاوسەران بەجێ دەهێڵن لەسەریان پێویستە {یان بۆیان پەسندە} وەسیەت بکەن بۆ هاوسەرەکانیان {لە سەرەمەرگدا وەسیەتیان بۆ بکەن} بۆ ماوەی ساڵێك لەو ژوورو ماڵەی خۆیان نەبرێنە دەرێ، وە نان‌و نەفەقەیان بۆ دابین بکرێ ﴿ فَإِنۡ خَرَجۡنَ ﴾، جا ئەگەر خۆیان چوونەدەر، واتە: پێش ئەوەی ئەو ماوەیە (ئەو ساڵە) تەواو بێت ﴿ فَلَا جُنَاحَ عَلَيۡكُمۡ ﴾، ئەوە ئێوە گوناهتان ناگات ﴿ فِي مَا فَعَلۡنَ فِيٓ أَنفُسِهِنَّ مِن مَّعۡرُوفٖ ﴾، لەوەدا کە بە شێوەیەکی پەسەند خۆیان برازێننەوەو خۆیان بۆن خۆش بکەن‌و بەرگی ئاسایی لەبەر بکەن ﴿ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٞ ﴾، وە خوا زاڵی کاربەجێیە، لێرەدا ئەو چوار مانگ‌و دە شەوە پێویستە ئافرەت لە عیددەدا بمێنێتەوە خۆی بۆن خۆش نەکات‌و بەرگی ئاسایی لەبەر نەکات، بەڵام ئەو ساڵە سوننەتە ئافرەت وا بکات، وە بۆ کەسوکاری مێردەکە سوننەتە ماوەی ساڵێك لێی گەرێن‌و مەسرەفی بکێشن ماڵ‌و سامانی بۆ دابین بکەن ﴿ وَلِلۡمُطَلَّقَٰتِ مَتَٰعُۢ بِٱلۡمَعۡرُوفِۖ حَقًّا عَلَى ٱلۡمُتَّقِينَ ﴾، وە بۆ ئافرەتانی تەڵاقدراو پێویستە بە شێوەیەکی پەسەند دیارییان بدرێتێ، ئەوە مافێکە لەسەر پارێزکاران، کەواتە: مسوڵمان ئەگەر بیەوێ چاکەکاربێ، پێویستە بەو شێوەیە مامەڵە بکات، وە ئەگەر بیەوێ پارێزکاریش بێ، دەبێ هەر وابکات، لە کۆتاییدا خوا دەفەرموێ: ﴿ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمۡ ءَايَٰتِهِۦ لَعَلَّكُمۡ تَعۡقِلُونَ ﴾، ئا بەم شێوەیە

خوا ئایەتەكانی خۆی بۆ ئێوە ڕوون دەكاتەوە بەڵكو بفامن {یاخود عەقڵتان زیادبێ}، چونكە بەهۆی قورئانەوە ئینسان هەم لەشتان تێدەگات هەم عەقڵ‌و هۆشی زیاد دەكات.

خوای پەروەردگار لەو كەسانەمان بگێڕێ كە بەهۆی زیاتر تێگەیشتن‌و سەرنجدانی قورئانەوە عەقڵ‌و هۆشیان زیاد دەكات‌و بەهێزتر دەبێ.

## چەند مەسەلەیەكی گرنگ

**مەسەلەی یەكەم:** كە دەفەرموێ: ﴿ وَٱلَّذِينَ يُتَوَفَّوْنَ مِنكُمْ وَيَذَرُونَ أَزْوَٰجًا يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْرًا ﴾، واتە: ئەی پیاوەكان ! ئەوانەتان كە دەمرێنرێن، وە لە دوای خۆیان كە هاوسەران بەجێ دەهێڵن، ئەو هاوسەرانەیان پێویستە چوار مانگ‌و دە شەو چاوەڕێ بكەن، واتە: چوار مانگ‌و دە شەو دەچنە عیددەوە، بۆیەش ناوی لێنراوە عیددە، چونكە ئەو ڕۆژو مانگانە دەژمێردرێن.

ئایا حیكمەتی عیددە چییە؟ بۆچی ئافرەت پێویستە دوای ئەوەی مێردی دەمرێ، چوار مانگ‌و دە شەو چاوەڕێ بكات‌و یەكسەر شوو نەكاتەوە ؟ چەند حیكمەتێكی تێدایە :

**حیكمەتی یەكەم:** بریتییە لە پاكبوونەوەی منداڵدانی ئافرەت، كە ئایا نوتفەی ئەو پیاوە لە منداڵدانیدا هەیە یان نا ؟ چونكە ئەگەر یەكسەر شوو بكاتەوەو دوایی منداڵی ببێ نازانن داخۆ ئەو منداڵە هی مێردە پێشووەكەیەتی، یان هی مێردی دووەمە.

**حیكمەتی دووەم:** ڕاگرتنی دڵی كەسوكاری پیاوەكە، كابرا كوڕی مردووەو بووكی بەجێماوەو یەكسەر بووكەكە بچێ شوو بكاتەوە، یان ماوەیەكی كەمی پێ بچێ شوو بكاتەوە، حەتمەن دڵیان دەڕەنجێ‌و ناڕەحەت دەبن.

**حیکمەتی سێیەم:** وەفای ئافرەتەکە بۆ مێردەکەی، ژن‌و مێرد دەبێ پێکەوە بەوەفابن، کابرا دوێنێ مردوە، ژنەکەی زوو بچێ شوو بکاتەوە، بەتەئکید هەم کەسایەتی ئافرەتەکە سووك دەبێ، وە هەم نیشانەی بێوەفاییە بەرانبەر بە پیاوەکەی.

وە دەگونجێ حیکمەتی دیکەش لەوبارەوە باس بکرێن، گرنگ ئەوەیە ئێمە دڵنیابین لەوەی هەرچی خوا فەرموویەتی، هەمووی پڕە لە حیکمەت‌و نهێنی، بەڵام جاری وا هەیە ئێمە دەرك بە هەندێکیان دەکەین، وە جاری واش هەیە دەرك بە زۆربەیان دەکەین، یان بە پێچەوانەوە دەرك بە هیچ کامیان، یان بە هەندێکیان ناکەین.

**مەسەلەی دووەم:** ئەو ئافرەتانەی کە مێردیان دەمرێ بەگشتی چوار جۆرن، واتە لەو ڕووەوە کە ئافرەت مێردی دەمرێ‌و دەبێ بچێتە عیددەوە، عیددە بشوات، چوار جۆرە ئافرەتن:

١/ یان ئافرەتێکە گوێزراوەتەوە، واتە: لە ماڵ‌و مێردی خۆی بووەو مێردەکەی چۆتە لای، ئەوە عیددەی چوار مانگ‌و دە شەوەو ئایەتەکە بە ڕوون‌و ڕاشکاویی فەرموویەتی.

٢/ یان ئافرەتەکە نەگوێزراوەتەوە، کە ئەویش بەهەمان شێوە مادام مارەکرابێ، دیسان دەبێ چوار مانگ‌و دە شەو بچێتە عیددەوە، کە ئەوەیان ئەگەر لەبەر ئەوەش نەبێت منداڵدانی پاك بێتەوە، حیکمەتەکانی دیکەی تێدا دێنە دی.

٣/ یاخود ئافرەتێکی کەم تەمەن‌و گچەکەیە، کە دیارە بەو چوار مانگ‌و دە شەوەش هیچ زیان ناکات، ئەگەر ئەوەندەش ڕابوەستێ‌و ئەو حیکمەتانەشی تێدان کە ڕاگرتنی دڵی کەسوکاری‌و پاراستنی کەسایەتی خۆی‌و گرفت پەیدانەبوونە!

شایانی باسیشە ئەم عیددە چوار مانگ‌و دە شەوییە، بۆ تێکڕای[1]

---

١) بڕوانە: (الجامع لأحكام القرآن) للقرطبي، ج: (٣)، ص: (١٥٩)، بەڵام زۆربەیان دەڵێن: عیددەی ئافرەتی کۆیلە نیوەی هی ئازادە، بەڵام لەڕاستیدا قسەی زۆربە نەپێکاوە، چونکە ئایەتەکە بەگشتی فەرموویەتی، وەك (القرطبي) گوتوویەتی‌و پشتگیریی قسەی (الأصمّ) ی کردووە.

هاوسەرانی مێرد مردوو، بە هەموو جۆرەكانیەوە: گەورەو گچكە، ئازادو كۆیلە، حەیزدارو لە حەیز چووەوە (یائسە)، مسوڵمانو خاوەن كتێب، گوێزراوەو نەگوێزراوە، (المدخول بها وغیر الدخول بها)، یەكدەنگی زانایانی لەسەرە، چونكە خوا بەگشتی فەرموویەتی: ﴿ ...يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْرًا ... ﴿٢٣٤﴾ ﴾ البقرة، هەڵبەتە بێجگە لە ئافرەتی ئاوس (حامل) كە ئەمیان ماوەی عیددەكەی دانانی كۆرپەكەیەتی، وەك لە خاڵی چوارەمدا دێ.

٤/ جۆری چوارەمی ئەوەیە كە ئافرەتەكە سك پڕ (حامل) بێ، ئەوەیان عیددەكەی خوای زاناو شارەزا، بە دەقی قورئان ڕوونیكردۆتەوە، دەفەرموێ: ﴿ ... وَأُوْلَاتُ ٱلْأَحْمَالِ أَجَلُهُنَّ أَن يَضَعْنَ حَمْلَهُنَّ ...﴿٤﴾ ﴾ الطلاق، واتە: ئەوانەی كە كۆرپەیان هەڵگرتوە، كاتی كۆتایی عیددەكەیان بریتیە لە دانانی حەملەكەیان، واتە: هەركاتێك كۆرپەكەیان بوو، ئەوە عیددەیان بەسەرچووەو بۆیان هەیە شوو بكەنەوە، جا هەندێك دەڵێن: دەبێ ماوەی زەیستانی بەسەربچێ كە چل (٤٠) شەوە، وە هەندێك دەڵێن: مەرج نیە ماوەی زەیستانیی بەسەربچێو، بۆی هەیە پێش ئەوەش مارە بكرێ، هەڵبەتە دیارە هەتا كاتی زەیستانیی بەسەرنەچێ، ناگوازرێتەوە، بەلام گرنگ ئەوەیە كە لەگەڵ كۆرپەكەی دانا {بە پێی ئەم ڕایە} بۆی هەیە شووبكاتەوە، لەوبارەشەوە ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەر ﷺ هەیە: {(عَنْ ابْنِ مَسْعُودٍ رضي الله عنه أَنَّهُ سُئِلَ عَنْ رَجُلٍ تَزَوَّجَ امْرَأَةً وَلَمْ يَفْرِضْ لَهَا صَدَاقًا، وَلَمْ يَدْخُلْ بِهَا حَتَّى مَاتَ، فَقَالَ ابْنُ مَسْعُودٍ: لَهَا مِثْلُ صَدَاقِ نِسَائِهَا، فَرَدَّدوا إِلَيْهِ مِرَارًا فِي ذَلِكَ فَقَالَ أَقُولُ فِيهَا بِرأيِ فَإِنْ يَكُن صَوَابًا فَمِنَ اللهِ وَإِن يَكُن خَطَأً فَمِنِّي وَمِنَ الشَّيْطَانِ وَاللهُ وَرَسُولُهُ بَرِيئَانِ مِنْهُ: لَهَا الصَّدَاقُ كَامِلاً، وفِي لَفْظٍ: لَهَا صِدَاقُ مِثْلِهَا، لاَ وَكْسَ وَلاَ شَطَطَ، وَعَلَيْهَا الْعِدَّةُ، وَلَهَا الْمِيرَاثُ، فَقَامَ مَعْقِلُ بنُ سِنَانٍ الأَشْجَعِيُّ فَقَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَضَى بِهِ فِي بِرْوَعَ بِنْتِ وَاشِقٍ، فَفَرِحَ عَبدُالله بِذَلِكَ فَرَحاً شَدِيداً {وَفِي رِوَايَةٍ}: فَقَامَ رِجَالٌ مِنْ أَشْجَعَ فَقَالوا: نَشْهَدُ أن رَسُولُ الله ﷺ قَضَى بِهِ فِي بِرْوَعٍ بِنْتِ وَاشِقٍ) (رَوَاهُ

أَحْمَد برقم: (١٥٩٤٣)، وَالتِّرمِذِيّ برقم: (١١٤٥) وَقَالَ: حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَالنَّسَائِيُّ برقم: (٣٣٥٥)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٤١٠٠)، وَصَحَّحَهُ الألباني في (سنن التِّرمِذِي)﴾، واتە: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود خوا لێی ڕازی بێ ﴿کە یەکێکە لە هاوەڵانی بەڕێزی پێغەمبەر ﷺ زۆر پیاوێکی شارەزا بووە﴾ پرسیاری لێکراوە دەربارەی پیاوێك ژنێکی مارەکردوە، بەڵام کابرا مردوە بەبێ ئەوەی ئافرەتەکە بگوازێتەوەو بچێتە لای، وە بێئەوەی مارەیشی بۆ دیاری بکات، چەند جارێك چوون بۆ لای عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوودو پرسیاریان لێکرد، ئەویش ﴿لەبەر ئەوەی لە پێغەمبەرەوە ﷺ هیچی لانەبوو، وە لە دەقی قورئانیشدا لەوبارەوە هیچی تێدانیە لە ڕواڵەتی قورئاندا دیارە زوو وەڵامی نەداونەوە﴾ سەرەنجام وەڵامی دانەوەو گوتی: بە ڕای خۆم شتێك دەڵێم، ئەگەر ڕاست بێ، ئەوە لە خواوەیەو، ئەگەر هەڵەش بێ، لە منەوەیەو لە شەیتانەوەیەو، خواو پێغەمبەری خودا دوورن لەو ڕایە هەڵە، (گوتی:) پێویستە مارەیی تەواوی بدرێتێ، وە لە بێژەیەکی دیکەدا: مارەیی هاووێنەی خۆی دەکەوێ، ﴿واتە: وەك مارەیی ئافرەتانی خزمی خۆی، یان خزمی مێردەکەی، ئەوان چەندیان دراوەتێ ئەویش ئەوەندەی بدرێتێ﴾، کە شەرعزانان بەمە دەڵێن: (مهر المثل) نە لە هی ئەوان کەمتر نە زیاتر، وە پێویستە عیددەش بژمێرێ، ﴿واتە: چوار مانگو دە شەو﴾، وە میراتیشی بدرێتێو میراتیش لە مێردەکەی دەگرێ، ﴿کە ئافرەت ئەگەر منداڵی نەبێت لە مێردەکەی، ئەوە چوار یەکی (٤/١) میرات دەگرێ، واتە: چوار یەکی ماڵو سامانی مێردەکەی دەبێتە هی ئەو ئافرەتە﴾، لەو کاتەدا (مَعْقِل بن سِنَان) کە یەکێکە لە هاوەڵان هەڵسا گوتی: من گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بووە دەربارەی (بیروەعی کچی واشیق) بەو شێوەیە حوکمی کرد، ﴿دیارە ئەو ئافرەتەش مێردی مردوە، بێئەوەی کە مێردەکەی گواستبێتیەوە، وە مارەییشی بۆ دیاری نەکردوە، پێغەمبەر ﷺ ئاوا بڕیاری بۆ داوە﴾ عەبدوڵڵاش زۆر بەوە دڵخۆش بوو ﴿کە فەتوایەکەی ئەو لەگەڵ هی پێغەمبەر ﷺ تێکی کردەوە، بەڵام پێشتر ئاگای لە فەتوای پێغەمبەر ﷺ نەبووە، ئەگەرنا یەکسەر دەیگوت: پێغەمبەری خوا وای فەرموە﴾، وە لە

ڕیوایەتێکدا هاتوه: پیاوانێك لە تیرەی ئەشجەع هەڵسان گوتیان: ئێمە شایەدیی دەدەین کە پێغەمبەر ﷺ دەربارەی (بیروەعی کچی واشیق)، بەهەمان شێوە فەتوای داوە.

**مەسەلەی سێیەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ فَإِذَا بَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ فِيمَا فَعَلْنَ فِيٓ أَنفُسِهِنَّ بِٱلْمَعْرُوفِ ﴾، جا هەر کاتێك ئافرەتان عیددەیان تەواو کرد، ئێوە گوناهتان ناگاتێ لەوەدا کە لە نەفسی خۆیاندا دەیکەن بە شێوەکی پەسەند، واتە: ئەگەر خۆ بڕازێننەوەو بەرگی جوان لەبەربکەن، ئێوە گوناهبار نابن، لەم ڕستەیە وەردەگیرێ، کە ئافرەتی مێرد مردوو دەبێ تازیە باریی بکات، کە بە عەرەبی پێی دەڵێن: (إِحدادْ) واتە: تازیە باریی، یانی چی؟ دەڵێن: نابێ بەرگی زرقو برق لەبەر بکاتو خۆی بۆن خۆش بکاتو، دەبێ پێیەوە دیاربێ کە ئەو ئافرەتە خەفەت بارو دڵتەنگە[1]، هەتا عیددەی بەسەردەچێ، بەڵام دوایی هەقی خۆیەتی کە لە سنووری باوو پەسەندا هەرچی لەگەڵ خۆیدا بیکات لە سنووری ئەدەبی شەرعییدا، کەس بۆ نیە ڕەخنەی لێ بگرێو پێی بڵێ: تۆ ساڵێك پێش ئێستا مێردت مردوە، چۆن دەبێ خۆت بڕازێنیتەوە ؟ یان پێنج مانگ پێش ئێستا مێردت مردوە ! نەخێر، مادام چوار مانگو دە شەوەکە تەواو بوو هەقی خۆیەتی، کەواتە: ئەوە کە زۆرجار لە زۆر تیرەو هۆزو لە زۆر ناوچەدا ئافرەت مولزەم دەکرێ، کە هەر شوو نەکاتەوە، بە تایبەتی ئەگەر منداڵی هەبێت، یاخود مولزەم دەکرێ کە ماوەیەکی زۆر تازیە باربێ، ئەوە شتێکی ناشەرعییەو ستەمێکە لەو ئافرەتانە دەکرێ، شەریعەت تەنیا چوار مانگو دە شەوی داناوە، ئەویش لەبەر ئەوەی لەو چوار مانگو دە شەوەدا، دەردەکەوێ داخۆ ئەو ئافرەتە سکی هەیە لەو پیاوەی پێشوو کە مردوە یان نا ؟ هەروەها لەبەر ئەو حیکمەتانەی دیکەش کە پێشتر ئاماژەمان پێکردن.

---

١) (الإحداد: ترك المرأة الزّينة كلّها، من اللّباس والطّيب والحُليّ والكُحلِ والخضاب بالحنّاء، مادامت في عِدَّتها...)، بڕوانە (الجامع لأحكام القرآن)، ج: (٣)، ص: (١٥٦).

**مەسەلەی چوارەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ وَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ فِيمَا عَرَّضْتُم بِهِۦ مِنْ خِطْبَةِ ٱلنِّسَآءِ أَوْ أَكْنَنتُمْ فِىٓ أَنفُسِكُمْ ﴾، گوناهتان ناگاتێ کە دەبەر ئافرەتان ڕابهاوێن‌و بە ئاماژە خوازبێنییان بکەن، یان لە دڵی خۆتاندا پەنهانیی بکەن، کەواتە:

١/ ئەوە دروستە، کە کوردەواریی خۆمان پێی دەڵێن: (کناره)، واتە: دەبەر ڕاهاوێشتن، بە عەرەبی (كِنَاية)ی پێ دەڵێن.

٢/ دروستە پیاو لە دڵی خۆیدا بڕیار بدا، کە ئەو ئافرەتە مارە بکات بیهێنێت، یان مارەی بکاتەوە، ئەگەر بێوە ژن بێت.

٣/ دروستە بە پەنهانیی قسەی ڕاسپێرێتێ بە مەرجێ قسەی باش بێ، واتە: ئەگەر ئامۆژگارییە، ئەگەر قسەیەکی خێرە، بەلاّم نەك باسی ژن هێنان‌و هاوسەرگیریی، بەلاّم ئەوەی کە دروست نیە لەگەڵ ئافرەتی عیددەداردا بکرێ:

١) بەڕاشکاویی قسەی لەگەڵدا بکات.

٢) بە پەنهانیی بەڵێن‌و پەیمانی لەگەڵدا ببەستێ کە بیخوازێ، یان قسەی لەو بابەتانەی بە کەسێکدا بۆ ڕاسپێرێ .

٣) بڕیاری گرێبەستی هاوسەریی بدات لە دڵی خۆیداو، عەزمی لەسەر جەزم بکات، بەر لەوەی عیددەی بەسەربچێ، ئەوانە هەرسێکیان قەدەغەن.

**مەسەلەی پێنجەم:** کە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ مَا فِىٓ أَنفُسِكُمْ فَٱحْذَرُوهُ ۚ وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ حَلِيمٌ ﴾، وە بزانن کە خوا دەزانێ، چ لە دەروونتاندا هەیە، دەجا وریا بن بە لێ ترسانەوە، وە بزانن کە خوا لێبووردەی هێدییە، ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کە ئەگەر ئینسان ئیمانی بە سیفەتەکانی خوا هەبێ، ئیمانی بەوە هەبێ کە خوا نێو دڵی دەخوێنێتەوە، ئەوە لە شەرم‌و ترسی خواو لەبەر چاودێریی خوا، نەك هەر بە زمانی دەبڕین‌و وشەی خراپ ناڵێ، بەڵکو لە دڵیشیدا هیچ نیازو مەبەستێکی

خـراپ، لـە ناچەسپێنـێ، چـونکە دەزانـێ کـە خـوای پەروەردگـار وەك چۆن وشـەکانی زمانی دەبیستـێو کردەوەکانی دەبینـێ، نێو دڵیشی دەزانـێو دەبینێ، بۆیـەش خـوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ حَلِيمٌ ﴾، وە بزانن کە خوا لێبوردەی هێدییە، واتـە: لێبوردەیە بۆ کەموکووڕییەکانتـان، وە هێمـنو مەندیـشە زوو سـزاتان نـادات، کەواتـە: ئەگـەر خـوا زوو سـزای نـەدای، لەگـەڵ ئەوەشـدا کـە هەڵـەو کەموکووڕییـت هەیـە، بزانـە کـە لەبـەر ئـەوەی خـوا هێدییە بۆیە جارێ سزات نـاداتو، مانـای وانیـە کـە خـوای دادگـەر هـەر سـزات نـادات، بەڵکو سـزایەکەی بـۆ هەڵگـرتووەو، ئەگـەر ئـەم جـارە سـزای نـەداوی، ئەوە ڕستەی بۆ درێژکردووەو دوایی سزات دەدات، ئەگەر هـەر بـەردەوام بـێ، کەواتـە: نـابێ ئەو هـەڵەیە دووبارە بکەیەوەو وابزانی دنیـا شامی شـەریفە.

**مەسەلەی شەشەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ لَّا جُنَاحَ عَلَيۡكُمۡ إِن طَلَّقۡتُمُ ٱلنِّسَآءَ مَا لَمۡ تَمَسُّوهُنَّ أَوۡ تَفۡرِضُواْ لَهُنَّ فَرِيضَةً ﴾، گوناهتـان ناگاتـێ کـە ئافرەتانێـك تـەڵاق بـدەن، کـە نەتانگواستوونەوە، وە مارەییشتان بۆ دیاری نـەکردوون، دیـارە ئـافرەتی دەسـت لـێ نـەدراوو مـارەیی بـۆ دانـەنراو، تەڵاقـدانی ئاسانتـرە، لـە ئافرەتێـك کـە گوازرابێتـەوەو مـارەیی بـۆ دیـاری کرابێـتو چووبێتـە مـاڵو مێـردی خۆیـەوە، هەڵبەتـە مانـای وانیـە کـە ئەوەش قەیـدێ ناکـات مـادام بـەبێ هـۆ بـێ ! دەبـێ هۆیـەك هەبێـتو پاساوێکی شـەرعیی هەبێتو بەڵگەیەکی بە دەستەوە هەبێت، ئەگەرنا هەر لەخۆوە تەڵاقی بدات، یان ئەگەر تەڵاقدانەکە گرفتی لـێ پەیدابێو ببێتـە هۆی شکاندنی ئافرەتەکە، بە تەئکید ئەو کاتە گوناهباریی تێدایە.

**مەسەلەی حەوتەم:** خوای پەروەردگار دەربارەی دیاریی پێدانی پیاو بە ئافرەتێك کە دەستی لـێ هەڵدەگرێو تـەڵاقی دەداو، جارێ نەیگواسـتۆتەوە مارەییـشی بـۆ دیـاری نـەکردوە، یـاخود مـارەیی بـۆ دیـاری کـردوە، دەفـەرموێ: ﴿ حَقًّا عَلَى ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴾، کـە وەك پێـشتریش باسـمکرد، واتـە: ئـەوە هەقێکـە لەسـەر

چاکەکاران، هەندێ لە توێژەرەوانی قورئان گوتوویانە: وەك لە هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتی: (٢٤١)دا دووەم کە دەفەرموێ: ﴿حَقًّا عَلَى ٱلْمُتَّقِينَ﴾، باسمان کرد، کە ئەمە بەڵگەی پێویست نەبوونی دیارییدان بە ئافرەتی تەڵاقدراوە، چونکە دەفەرموێ: ئەوە هەقێکە لە ئەستۆی چاکەکاران دایە، کابراش دەتوانێ بڵێ: ئەگەر ویستم چاکە دەکەمو ئەگەر کەیفم لێ نەبوو چاکە ناکەم، بەڵام من وای تێدەگەم کە مانای: ﴿حَقًّا عَلَى ٱلْمُحْسِنِينَ﴾، ئەوەیە کە خوا دەفەرموێ: ئەوە هەقەو پێویستە لەسەر چاکەکاران یانی: فەرزە، چونکە مسوڵمان دەبێ چاکەکاربێو ئەگەر چاکەکار نەبێ خراپەکار دەبێ، ئەگەر خراپەکاریش بێ خوا سزای دەدا، کەواتە: ئەگەر ئەو دیارییو خەڵاتە نەدات بەو ئافرەتە، مانای وایە خراپەی کردو، کە خراپەشی کرد خوا سزای دەدا، کەواتە: ئەمە ئەوە ناگەیەنێ کە سوننەتە، بەڵام بۆیە خوای کاربەجێ لە ئایەتی دواییدا کە دوایی باسی دەکەین، دەفەرموێ: ﴿حَقًّا عَلَى ٱلْمُتَّقِينَ﴾، بۆ ئەوەی هەر کەسێ بە هەڵە لەم ئایەتە تێگەیشتبێ، تێگەیشتنی خۆی ڕاست بکاتەوەو بزانێ، کە ئەگەر بیەوێ پارێزکاربێو ئەهلی تەقوابێ، دەبێت ئەو دیارییو خەڵاتە بدات بەو ئافرەتە.

**مەسەلەی هەشتەم:** کە دەفەرموێ: ﴿إِلَّآ أَن يَعْفُونَ أَوْ يَعْفُوَاْ ٱلَّذِى بِيَدِهِۦ عُقْدَةُ ٱلنِّكَاحِ﴾، ﴿إِلَّآ أَن يَعْفُونَ﴾، یانی چی؟ یانی: ئافرەتەکان ئەو پیاوانە عەفوو بکەن کە مارەییان بۆ دیاری کردوون، بەڵام نەیانگواستوونەتەوە، لە نیوەی مارەیی، چونکە خوا دەفەرموێ: ﴿فَنِصْفُ مَا فَرَضْتُمْ﴾، کاتێك کە ئافرەت نەگوازرابێتەوە، بەڵام مارەیی بۆ دیاری کرابێ، نیوەی مارەییەکەی دەکەوێ، جا یان دەبێ ئافرەتان لەو نیوە مارەییە، پیاوەکان عەفوو بکەن، ﴿أَوْ يَعْفُوَاْ ٱلَّذِى بِيَدِهِۦ عُقْدَةُ ٱلنِّكَاحِ﴾، یان دەبێ ئەو کەسەی گرێبەستی هاوسەرگیریی بەدەستە، ئافرەتەکە لەو نیوە مارەییەی دیکە ببەخشێو،

هەمووی پێبدات کە مەبەست پێی مێردە، بەڵام هەندێك گوتوویانە: مەبەست پێی بابە، بابی ئەو ئافرەتەیە کە مارەی کردوە، چونکە ئەو گرێبەستەکەی بەدەستە، یاخود مامیەتی، یاخود برایەتی، واتە: ئەو پیاوەی کە ئافرەتەکەی مارە بڕیوە لە مێردەکەی، واتە: یان ئافرەتەکە بۆخۆی پیاوەکە لە نیوەی مارەییەکە عەفوو بکات، یاخود ئەوەی کە مارەی بڕیوە عەفووی بکات، بەڵام من پێم وایە کە ئەوەی دیکەیان ڕاستە، چونکە باب کە کچەکەی مارە دەبڕێ، یاخود برا کە خوشکەکەی مارە دەبڕێ، یاخود مام کە برازایەکەی مارە دەبڕێ، یان کوڕ کە دایکی مارە دەبڕێتەوە لە کەسێك، لەڕاستیدا هیچ کامیان خاوەنی ئەو مارەییە نین، تاکو بیبەخشن بەڵکو ئافرەتەکە بۆخۆی خاوەنی مارەییەکەیە، بۆیە مانای ڕاستتر ئەوەیە کە: ﴿أَوْ يَعْفُوَا۟ ٱلَّذِى بِيَدِهِۦ عُقْدَةُ ٱلنِّكَاحِ﴾، مەبەست پێی مێردە، کە ئەو لەو نیوەیەی کە دەیکەوێتەوە بیبەخشێ‌و هەموو مارەییەکەی بە تەواویی بداتێ، چونکە لە فەرموودەی پێغەمبەریشدا ﷺ هاتوە، کە فەرموویەتی: {(وليّ العقد الزَوْج) (رَوَاهُ ابن أبي حاتم في (تفسيره)، مُعَلَّقَاً، وابن مردويه، واختارهُ ابن جَرير، عَنْ عُمْرِو بن شُعَيب عَنْ أبيهِ عَنْ جدهِ مرفوعاً، وَضَعَّفَهُ الألباني في (إرواء الغليل) برقم: (١٩٣٥)}، واتە: سەرپەرشتیاری گرێبەستی هاوسەرگیریی مێردە، ئەو گرێبەستەکەی بەدەستە.

**مەسەلەی نۆیەم:** کە دەفەرموێ: ﴿وَلَا تَنسَوُا۟ ٱلْفَضْلَ بَيْنَكُمْ﴾، چاکەو بەخشش لەنێو خۆتاندا لە بیرمەکەن، جاری وایە وەزعی پیاوەکە باش نیە لە ڕووی ئابوورییەوە، ئەگەر ئافرەتەکە بەخشندەیی بنوێنێ‌و بڵێ: مادام نەیگواستوومەتەوە، ئەوە من دەیبەخشم لەو نیوە مارەییە، با ئەو هەوڵبدات خاوەنی فەزڵ بێ، مادام پیاوەکە موحتاجە، یان لەسەر ئەندازەیەکی زۆر مارەکراوە، وە جاری واهەیە کە نەخێر پیاوەکە وەزعی باشەو دەربەست نیە، با بڵێ: جا ئەو نیوە مارەییەی دەیکەوێت ئەوە واجبەو ئەوە نیوەکەی

دیکەش مـن فـەزڵو چـاکەی لەگـەڵ دەکـەمو پێیدەبەخـشم، بۆیـە خـوا بـۆ هەردووکیانی فەرمووە: ﴿ وَلَا تَنسَوُا۟ ٱلۡفَضۡلَ بَیۡنَكُمۡ ﴾، چاکەو بەخشینی نێوان خۆتـان فـەرامۆش مەکەن، هەر کامێکتـان زیـاتر بـۆی هەڵسوورا، بـا هەوڵبـدات خـاوەنی بەخشش‌و جوامێریی بێ، چ پیـاوەکە چ ئافرەتەکە.

**مەسـەلەی دەیـەم:** کـە دەفـەرموێ: ﴿ حَـٰفِظُوا۟ عَلَى ٱلصَّلَوَ ٰتِ وَٱلصَّلَوٰةِ ٱلۡوُسۡطَىٰ رُكۡبَانًا ﴾، پارێزگاریی بکەن لە نوێژەکان، سـەرەتا ئـەم فەرموودەیـەی پێغەمبـەر ﷺ دێنینـەوە دەربـارەی پارێزگـاریی لـێکردنی نوێـژ: {(عَنْ ابنِ مَسْعُودٍ قَالَ سألْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ: أيُّ العَمَلِ أفْضَلُ؟ قَالَ: (الصَّلاَةُ لِوَقْتِهَا)، قَالَ: قُلْتُ: ثُمَّ أيٌّ؟ قَالَ: (بِرُّ الوَالِدَيْنِ)، قَالَ: قُلْتُ: ثُمَّ أيٌّ؟ قَالَ: (الجِهَادُ فِي سَبِيلِ اللهِ)) (مُتّفَقٌ عَلَيْهِ، البُخَارِيُّ برقم: (٥٢٧)، وَمُسلم برقم: (٢٤٨))}، واتـە: عەبـدوڵڵای کوڕی مەسـعوود دەڵـێ: پرسـیارم لـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ کـرد: چ کردەوەیـەك باشـترە لە هەموو کردەوەکان؟ فەرمووی: نوێژ لەکاتی خۆیدا، گوتم: دوای ئەو ؟ فەرمووی: چاکە لەگەڵ بـابو دایـك، گـوتم: دوای ئـەو ؟ فـەرمووی: تێکۆشـان لـە پێناوی خوادا، سەرنج بدەن ڕیزبەندیی یەکی چەند جوانە: نوێژ لەکاتی خۆیدا، هەقی خوایە، چاکە لەگەڵ دایكو باب، هەقی نزیکتـرین کەسە کە دایـكو بـابن، تێکۆشـان لـە پێنـاوی خـوادا، هـەقی ئۆممەتـە، ئـەم سـێ کردەوەیـە لـە هـەموو کردەوەکان چاکتـرن، جـا ئایـا پارێزگـاریی لێکردنـی نوێژەکـان، یـانی چـی؟ خـوا دەفـەرموێ: ﴿ حَـٰفِظُوا۟ عَلَى ٱلصَّلَوَ ٰتِ ﴾ نوێـژەکان بپـارێزن، چـەند واتایـەك دەگەیەنی:

١- لـە ڕووی کاتـەوە بیانپـارێزن، لـەکاتی خۆیانـدا بیانکەن وەك حەدیـسەکەش دەفـەرموێ: (الصَّلاَةُ لِوَقْتِهَا) نوێـژ لەکـاتی خۆیـدا، نوێژەکـەت ئاگـات لـێبـێ لە کاتی خـۆیـدا بیکە.

٢- لە ڕووی ڕواڵـەتـەوە بیانپـارێـزەو نوێژەکەت بەو شێوەیە بکە، کـە شـەریعەت دایناوە، وشەکان کە دەخوێنی بە ڕێكو پێکی بیان خوێنـە، ڕکووعو سـەجدەو

تەحییات، ڕاوەستان جموجوڵەکان، هەموو بە ڕێك و پێکیی بن، خۆت مەجووڵێنە، ئاورمەدەوە...هتد.

٣- لە ڕووی نێوەڕۆکەوە نوێژەکەت بپارێزە، کە لەڕاستیدا نێوەڕۆك مەبەستی هەرە گەورەی نوێژە، وەك خوای زاناو شارەزا دەفەرموێ: ﴿ قَدْ أَفْلَحَ الْمُؤْمِنُونَ (١) الَّذِينَ هُمْ فِي صَلَاتِهِمْ خَاشِعُونَ (٢) ﴾ المؤمنون، واتە: بەڕاستی بڕواداران سەرفرازن، ئەوانەی کە لە نوێژەکانیاندا گەردەنکەچن و بەشەرم و لێترسان و سام و هەیبەت کردن لە خواوە ڕادەوەستن.

٤- وە مانای پارێزگاریی کردن لە نوێژ ئەوەیە، کە داخوازییەکانی نوێژ جێبەجێ بکرێن، وەك کردنی چاکەو خۆ دوورگرتن لە خراپە، چونکە خوا فەرموویەتی: ﴿ ...إِنَّ الصَّلَاةَ تَنْهَىٰ عَنِ الْفَحْشَاءِ وَالْمُنكَرِ ۗ وَلَذِكْرُ اللَّهِ أَكْبَرُ ...(٤٥) ﴾ العنكبوت، واتە: بێگومان نوێژ خاوەنەکەی قەدەغە دەکات لە هەموو قسەیەکی ناقۆڵاو لە هەموو کردەوەیەکی خراپ. کەواتە: دەبێ تۆ مادام نوێژکەری ئەگەر بتەوێ نوێژەکەت بپارێزی، دەبێ شوێنەواری نوێژەکەت لە تۆدا پەیدابێ، کە بریتییە لە چاکەکردن و بەپێی توانا هەموو چاکەکان بکەی، وە خۆت دوور بگری لە هەموو خراپەکان.

**مەسەلەی یازدەیەم:** مەبەست لە نوێژی نێوەڕاست ﴿ وَالصَّلَاةِ الْوُسْطَىٰ ﴾ چییە؟ کە دەفەرموێ: ﴿ حَافِظُوا عَلَى الصَّلَوَاتِ ﴾، مەبەست پێی هەموو نوێژەکانە، نوێژە فەرزەکان و نوێژە سوننەتەکان دەگرێتەوە، دەبێ هەموویان پارێزگارییان لێ بکرێ، بەڵام: ﴿ وَالصَّلَاةِ الْوُسْطَىٰ ﴾، نوێژی نێوەڕاست، نوێژی عەسرە، نوێژی ئێوارەیە، وەك لە دەقی سوننەتی پێغەمبەری خوا ﷺ هاتوە: {(روى الإمام أحمد عَنْ عَلي رضي الله عنه، قَالَ: قَالَ رسولَ الله ﷺ يومَ الأحزَابِ: شَغَلُونَا عَنِ الصَّلاَةِ الوُسْطَى، صَلاةِ العَصْرِ، مَلأَ اللهُ قلُوبَهُم وَبُيُوتَهُمْ ناراً) (رَوَاهُ البُخَارِيُّ برقم: (٤٥٣٣)، وَمُسلم برقم: (١٤٢٤)، وَغَيرهُم}،

واتە: عەلی کوڕی ئەبو طالیب خوای لێ ڕازی بێ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژی ئەحزاب (واتە: لە جەنگی خەندەق)دا فەرمووی: ئێمەیان بێ ئاگا کرد (واتە: لە ئێمەیان چوواند) نوێژی نێوە ڕاست، نوێژی عەسر، خوا دڵیان و ماڵەکانیان پڕبکات لە ئاگر.

مانای وایە پێغەمبەر ﷺ تەفسیری: ﴿وَٱلصَّلَوٰةِ ٱلْوُسْطَىٰ﴾ی کردوە بەوە کە نوێژی عەسرە، بەڵام هەندێکیش دەڵێن: نوێژی نیوەڕۆیە، لەبەر ئەوەی دەکەوێتە نێوانی شێوان و خەوتنان لە لایەك و عەسرو شێوان لە لایەك، بەڵام بەهەرحاڵ مادام پێغەمبەر ﷺ وای تەفسیر کردبێ، وە بەڕاستیش کاتی نوێژی عەسر لە کاتەکانی دیکە هەستیارترە، خەڵك سەرگەرمی کاروکەسابەتە، کاتەکانی دی: شێوانە، کابرا دەچێتەوە ماڵ، خەوتنانە ئەوە مەجالی هەیە، بەیانییە مەجالی زیاترە، نیوەڕۆیە کاتی ئیسڕاحەتە، بەڵام نوێژی عەسر کاتی گەرمەی کارو کەسابەتە.

**مەسەلەی دوازدەیەم:** کە دەفەرموێ: ﴿وَقُومُوا۟ لِلَّهِ قَـٰنِتِينَ﴾، واتە: بە ملکەچیی یان بە بێدەنگیی ڕابوەستن بۆ خوا لە نوێژێدا، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {(إِنَّ فِي الصَّلاَةِ شُغْلاً) (رَوَاهُ مُسلم برقم: (١٢٠١))}، واتە: لە نوێژێدا سەرقاڵیی هەیە، واتە: سەرقاڵی بە خوای میهرەبانەوە، بە گفتوگۆو ڕازو نیاز لەگەڵ خوادا، هەروەها پێغەمبەر ﷺ کاتێ کە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود سەلامی لێکردو پێغەمبەر ﷺ لە نوێژێدا بوو، وەڵامی نەدایەوە، فەرمووی: {(إِنَّ هَذِهِ الصَّلاَةَ لاَ يَصْلُحُ فِيهَا شَيْءٌ مِنْ كَلاَمِ النَّاسِ إِنَّمَا هُوَ التَّسْبِيحُ وَالتَّكْبِيرُ وَقِرَاءَةُ الْقُرْآنِ) (رَوَاهُ مُسلم برقم: (١١٩٩))}، واتە: ئەم نوێژە هیچ شتێك لە قسەی خەڵکی تێدا ناگونجێ، بەڵکو بریتیە لە خوا بە پاکگرتن و بە گەورەگرتن و خوێندنی قورئان.

**مەسەلەی سێزدەیەم:** کە دەفەرموێ: ﴿فَإِنْ خِفْتُمْ فَرِجَالًا أَوْ رُكْبَانًا﴾، {لە کاتی ئاساییدا نوێژ بکەن بەو شێوەیەو پارێزگاریی لە نوێژەکان بکەن}، جا ئەگەر ترستان هەبووو کەوتنە حاڵەتی ترسەوە {لە جەنگدا، یاخود

دوژمنێکت بۆ هاتوە، یاخود دڕندەیەکت بۆ هاتوە، یان هەر شێوەیەك لە شێوەکانی ترس، کە لە حاڵەتی ئاسایی بچێتە دەرێ}، ئەوە بە پیادەیی نوێژ بکەن، {بە پێوە بڕۆن‌و نوێژ بکەن} یاخود بە سواریی، {سواری وڵاخ، یاخود سواری سەیارەش ببەو نوێژی خۆشت بکە}.

**شایەنی باسیشە لەبارەی چۆنیەتی نوێژی ترسەوە، دوو ڕا هەن:**

**ڕای یەکەم:** دەڵێ: هەرکات مسوڵمانان کەوتنە نێو ترسەوە، لە جەنگدا، یان هەر ترسێکی دیکە، نوێژەکەیان چۆن بۆ هەڵسووڕا، دەیکەن، وە ڕکووع‌و سەجدەش بەپێی توانا دەبەن، لەوبارەوە ئەم دەقە هەیە: {(قَالَ مَالِك عَنْ نَافِع: أَنَّ ابن عُمَر رَضِيَ اللهُ عَنْه كَانَ إِذَا سُئِلَ عَنْ صَلاَةِ الخَوْفِ، وصفها، ثُمَّ قَالَ: فَإِنْ كَانَ خَوْفٌ أشَدَّ مِنْ ذَلِكَ، صَلَّوْا رِجالاً قياماً عَلَى أَقْدَامِهِمْ، أَوْ رُكْبَانَاً، مُسْتَقْبِلي القِبلَةَ أَوْ غَيْرَ مُسْتَقْبِلِيهَا، قَالَ نَافِعٌ لا أَرَى عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ذَكَرَ ذَلِكَ إِلاَّ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ) (رَوَاهُ البُخَارِيُّ برقم: (٤٥٣٥)}، واتە: مالیك، {واتە: مالیکی کوڕی ئەنەس، کە مەزهەبی ئیمامی مالیك بەناوی ئەوەوەیە} لە نافیعەوە دەگێڕێتەوە، {نافیعیش قوتابی عەبدوڵڵای کوڕی عومەری کوڕی خەتتابە خوا لێیان ڕازی بێ} دەڵێ: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر کە پرسیاری لێدەکرا دەربارەی نوێژی ترسێ، باسی دەکرد نوێژی ترسی بەو شێوەیەی کە دەکرێ، کرد، دوایی گوتی: ئەگەر ترسەکە لەوە زیاتر بوو {کە دیارە ئەم ئایەتەی ئێرە مەبەستی پێ ئەوەیە، ترسێك بێت کە نەتوانی نوێژی ترسی بە کۆمەڵی تێدا بکەی کە (صَلاةُ الخَوف)ی پێ دەڵێن، بەڵکو حاڵەتەکە وابێ هەر کەسە ناچار بێ بەتەنێ نوێژەکەی خۆی بکات} ئەوە بە پێوە نوێژی خۆیان دەکەن، لەسەر پێیان، یان بە سواریی، ڕوو بە قیبلە یاخود ڕوویشیان لە قیبلە نەبێ، جا (نافِع) گوتوویەتی: من پێم وانیە عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ئەمەی باس کردبێ، مەگەر لە پێغەمبەرەوە ﷺ، کە دیارە هەرواشەو عەبدوڵڵای کوڕی عومەر زۆر پابەند بووە بە سوننەتەوەو لەخۆوە ئەوەی نەگوتوە، دیارە ئەوەی لە پێغەمبەر ﷺ بیستوە بۆیە وایگوتوە.

**ڕای دووەم:** دەربارەی نوێژی ترس، {بەڵام ئەو ترسە نا کە بتوانن نوێژی بە کۆمەڵ بکەن، کە پێغەمبەر ﷺ لە (عُمْرَةُ القَضَاء)دا کردوویەتی، وە لە چەند حاڵەتێکدا نوێژی ترسیان کردوە بە کۆمەڵ، کە دەبنە دووبەش، بەشێکیان حەرەسیات دەگرن‌و بەشێکیان نوێژ دەکەن، دوایی ئەوانی دیکە دێن‌و چەند شێوەیەکی هەیە، بەڵکو حاڵەتێکی ترسی وایە کە ناگونجێ بە کۆمەڵ نوێژەکەیان بکەن} ئەوەیە کە نوێژەکەیان لەو کاتەدا ناکەن، بەڵکو دوای ئەوەی حاڵەتی ترسەکە بەسەر دەچێ، نوێژی ئاسایی خۆیان دەکەن، وە ناشڵێن دەیگێڕینەوە، ئەم ڕایەش هی (أوزاعي ومكحول)ە، کە دوو زانای گەورەن‌و لەوبارەوەش ئەم دەقە هاتوە: {(وَقَالَ أَنَس بن مَالِكٍ رضي الله عنه حَضَرْتُ مُنَاهَضَةَ حِصْنِ تُسْتُرَ عِنْدَ إِضَاءَةِ الفَجْرِ، واشْتَدَّ اشْتِعَالُ القِتَالِ، فَلَمْ يَقْدِرُوا عَلَى الصَّلاَةِ، فَلَمْ نُصَلِّ إِلاَّ بَعْدَ ارْتِفَاعِ النَّهَارِ، فَصَلَّيْنَاهَا وَنَحْنُ مَعَ أَبِي مُوسَى فَفُتِحَ لَنَا، قَالَ أَنَسٌ: وَمَا يَسُرُّنِي بِتِلْكَ الصَّلاَةِ الدُّنْيَا وَمَا فِيهَا) (رَوَاهُ البُخَارِيُّ برقم: (٩٤٤))}، واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ من ئامادە بووم لە کاتی ئابڵووقەدانی قەڵای (توستور)دا {کە قەڵایەکە کاتی خۆی لە ئێران بووە} لە کاتی بەرەبەیاندا جەنگ زۆر گەرم بوو، نەیانتوانی نوێژ بکەن‌و نوێژەکەیان بۆ نەکرا {ئەگەر نوێژیان کردبایە تێکدەشکان، یان قەڵاکەیان بۆ نەدەگیراو ئیشی چەند ڕۆژەیان دەچۆوە هیچێ} نوێژەکەمان نەکرد هەتاکو ڕۆژ بەرز بۆوە {چونکە هەر خەریکی گرتنی قەڵاکە بوون، ئنجا} دوای ئەوە گەیشتینە حاڵەتی چێشتەنگاو یان دەمەو نیوەڕۆ، ئنجا نوێژەکەمان کرد کە دیارە نوێژی بەیانی بوو)، وە ئێمە (لەو جەنگەدا) لەگەڵ ئەبو مووسای ئەشعەریی بووین خوا لێی ڕازی بێ‌و قەڵاکەمان گرت، جا ئەنەس دەڵێ: من دڵخۆش نیم کە بەو نوێژە دنیاو هەرچی لە دنیادا هەیە بمدەنێ‌و ئەو نوێژەیان بدەمێ، نایگۆڕمەوە، واتە: هێندە ئومێدم بەو نوێژە هەیە کە لە وەختی خۆیشیدا نەکراوە، بەڵام لەو کاتەدا دیارە شتێکی لە نوێژی پێویستتر لە ئارادا بووە، کە بەرژەوەندیی

ئیسلامو مسوڵمانانی پێوە پەیوەست بووە.

منیش پێم وایە مەسەلەکە ئاوایە: کە جاری وایە مرۆڤ بە ئیشارەتیش نوێژی بۆ ناکرێ، شەڕەکە هێندە گەرمەو هێندە خەست بۆتەوە، بۆیە بە ناچاری دەبێ نوێژەکەی دوا بخاتو ئەوەش مەجالی تێدا هەیە، وە ئەگەر دەرفەتیش بوو، دەتوانێ بەو شێوەیەی کە بۆی گونجا نوێژەکەی بکات، کەواتە: ئەو دوو ڕایە، وەك زۆر دووڕا یان زیاتری جیاواز، تێك ناگیرێن، بەڵکو هەر کامێکیان بۆ حاڵەتێکی تایبەتە.

**مەسەلەی چوارەیەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ وَٱلَّذِينَ يُتَوَفَّوْنَ مِنكُمْ وَيَذَرُونَ أَزْوَٰجًا وَصِيَّةً لِّأَزْوَٰجِهِم ﴾ زۆر لە زانایان گوتویانە ئەم ئایەتە (نَسْخ) کراوەتەوە بە ئایەتی پێشوو، کە دەفەرموێ: ﴿ وَٱلَّذِينَ يُتَوَفَّوْنَ مِنكُمْ وَيَذَرُونَ أَزْوَٰجًا يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْرًا ﴾، ئەم ئایەتە (٢٤١) دەفەرموێ: ئەوانەتان کە دەمرێنرێن، وە ئافرەتان کە لە دوای خۆیان بەجێ دەهێڵن، با لە سەرەمەرگدا وەسیەت بکەن بۆ خێزانەکانیان بۆ ئەوەی ماوەی ساڵێك نانو نەفەقەیان بکێشرێو لە ماڵەکەیان نەبرێنە دەرێ، ئایەتی پێشووش ژمارە (٢٣٤) دەفەرموێ: ئافرەتانێك کە مێردیان دەمرێ چوار مانگو دە شەو لە عیددەدا دەبن، ئەمەشیان دەڵێ: ساڵێك، بۆیە زۆر لە زانایان گوتویانە: ئەم ئایەتە بە ئایەتە پێشووەکە نەسخ کراوەتەوە، واتە: ئایەتەکە هەرچەندە ئەوی دیکە لە ڕووی ڕێزبەندییەوە لە پێشەوەیە، بەڵام ئەویان (ناسخ)ەو ئەمەیان (مَنسُوخ)ە، جا ئەگەر لە یادتان بێ، من لە دەرسەکانی پێشوودا، باسی ئەوەم کرد کە من قەناعەتم وایە وەك ژمارەیەك لە زانایان قەناعەتیان وایە، کە هیچ ئایەتێك لە قورئاندا نیە (مَنسُوخ) بێت، واتە: هیچ ئایەتێك لە قورئاندا نیە کە ئیشی پێ نەکرێت، ئەدی چۆن ئەو دوو ئایەتە پێکەوە دەگونجێن ؟!

ڕاستییەکەی ئەوەیە، ئەم ئایەتە (٢٤١) دەفەرموێ: ئافرەت مافی هەیە ماوەی ساڵێك لە ماڵی مێردیدا بمێنێتەوە، ئەگەر مێردەکەی وەسیەتی بۆ بکات، یاخود

کەسوکاری مێردەکەی ئامادەبن ئافرەتەکە بۆی هەیە، واتە: ئافرەتەکە وای بۆ چاکەو بۆی هەیە سالێك بمێنێتەوەو، وێڕای ئەوەی کە چوارمانگو دە شەو لە عیددەدا دەبێ، بە چوار مانگو دە شەوەکەوە ماوەی سالێك لە مالی مێردە مردووەکەیدا بمێنێتەوەو، مەسرەفیشی بکێشرێو ڕێزیشی لێ بگیرێو خزمەتی بکرێ، بۆ مێردەکە واچاکە ئەو وەسیەتە بکات، بەلام لەسەر ئافرەتەکە پێویست نیە سالێك بمێنێتەوە، ئەدی چوارمانگو دە شەوەکە؟ ئەوە واجبە، وە ئەمەیان، واتە: ماوەی سالێك: سوننەتە، کەواتە تێك ناگیرێنو ئەمە وەك ئەوە وایە یەکێك بێت بۆ لام بلێ: ئەوەندەم پارە هەیە، دەلێم: کاکە گیان تۆ ئەوەندە زەکاتەت لێکەوتوە، بۆ وێنە: دە هەزار دینار زەکاتت لێکەوتوە، بەلام ئەگەر بیست هەزار دیناریشی لێبدەی، ئەوە ئەو دە هەزارەیان بەخشینو خێرە بۆخۆت دەیکەی، بەلام دە هەزارەکەی دیکەیان واجبەو دەبێت بیدەی، لێرەش ئەو حەوت مانگو بیست ڕۆژە زیادەی کە ژن، لە مالی مێردی وەفات کردوویدا دەمێنێتەوە، ئەوە ئەگەر وا بکات بۆی باشە، وە ئەگەر پیاوەکە وەسیەتی بۆ بکاتو بلێ: ماوەی سالێك با لە مالدا بمێنێتەوە بۆ وی واباشە، وە بۆ کەسوکاری وا باشە، بەلام هیچیان مولزەم نین بەوەوە، بەلام ئافرەتەکە مولزەمە وە ئەوانی دیکەش مولزەمن بەوەی کە چوار مانگو دە شەو ژنەکە لە عیددەدا بێت، دیارە هیچ کاتێکیش واجبو سوننەت تێکناگیرێن، کە دەلێی: ئەو شتە ئەوەندەی واجبەو ئەوەندەشی سوننەتە، هیچ پێویست ناکات بلێی: ئەو واجبە ئەو سوننەتەی نەسخ کردۆتەوە، ئنجا لەوبارەوە (إبن كثير) ئەم دەقەی لە تەفسیرەکەیدا هێناوە:[1] {(وَرَوى البُخاري عَنِ مُجَاهِدٍ ﴿وَٱلَّذِينَ يُتَوَفَّوْنَ مِنكُمْ وَيَذَرُونَ أَزْوَاجًا﴾، قَالَ: كَانَتْ هَذِهِ العِدَّةُ، تَعْتَدُّ عِنْدَ أهْلِ زَوْجِهَا وَاجِبَةً، فَأَنْزَلَ اللهُ: ﴿وَٱلَّذِينَ يُتَوَفَّوْنَ مِنكُمْ وَيَذَرُونَ أَزْوَاجًا وَصِيَّةً لِّأَزْوَاجِهِم مَّتَٰعًا إِلَى ٱلْحَوْلِ غَيْرَ إِخْرَاجٍ فَإِنْ خَرَجْنَ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ فِي مَا فَعَلْنَ فِيٓ أَنفُسِهِنَّ

---

١) (المِصْبَاحُ المنير...)، ص: (١٧٧) .

مِن مَّعْرُوفٍ ﴾، قَالَ: جَعَلَ اللهُ لَهَا تَمَامَ السَّنَةِ سَبْعَةَ أَشْهُرٍ وَعِشْرِينَ لَيلَةً وَصِيَةً، إِنْ شَاءَتْ سَكَنَتْ فِي وصِيَّتِهَا، وَإِنْ شَاءَتْ خَرَجَتْ) (رَوَاهُ البُخَارِيُّ برقم: (٤٥٣١)}، واتە: بوخاریی لە موجاهیدەوە دەگێڕێتەوە، کە ئەم ئایەتەی پێشێ کە دەفەرموێ: ئەوانەی کە دەمرنو لە دوای خۆیان ژن بەجێ دەهێڵن چوار مانگو دە شەو چاوەڕێ دەکەن، فەرمووی: ئەوە ئەو عیددەیەیە، کە واجبە لەسەر ئافرەت لەلای کەسوکاری مێردە وەفات کردوەکەی ئەو عیددەیە تێپەڕێنێت، دوایی خوای زانا ئەم ئایەتەی نارده خوارێ، کە دەفەرموێ: ﴿ وَٱلَّذِينَ يُتَوَفَّوْنَ مِنكُمْ وَيَذَرُونَ أَزْوَٰجًا وَصِيَّةً لِّأَزْوَٰجِهِم مَّتَٰعًا إِلَى ٱلْحَوْلِ غَيْرَ إِخْرَاجٍ ﴾، خوا بۆی کردە ساڵێکی تەواو، چونکە حەوت مانگو بیست شەو لەگەڵ چوار مانگو دە شەو دەکاتە ساڵێکی تەواو، ئەوەش وەك وەسیەتێك ئافرەتەکە ئەگەر بیەوێ بەپێی وەسیەتی مێردەکەی دادەنیشی لە ماڵی مێردەکەی، وە ئەگەر نەشیەوێ دوای چوارمانگو دەشەوەکە ماڵی مێردی بەجێ دەهێڵێ.

شایانی باسە (ئەبو موسلیمی ئەصفەهان)یش هەر ڕایەکی لەم جۆرەی هەیە کە دەڵێ: ئەو چوار مانگو دە شەوە پێویستە، بەڵام ماوەکە دیکەی ئەو ساڵە، واتە زیادە لە چوار مانگو دە شەو، شتێکی پەسەندو چاکە، کە هەم مێرد ئەو وەسیەتە بکاتو هەم ئافرەتیش ئەوەندە بمێنێتەوە، وەك (القاسمي) لە تەفسیرەکەیدا هێناویەتی[1]، وە (ئەبو موسلیمی ئەصفەهانیی)یش یەکێکە لە زانایانی ناودار کە کۆمەڵێك ڕای تایبەتی خۆی هەن، جا لەوبارەوە دەڵێت: {(وَالسَّبَب أَنَّهُم كَانوا فِي زَمَان الجَاهِلِيَة يُوصُون بِالنَّفَقَة والسكنى حَولاً كَامِلاً، وَكَانَ يَجِب عَلَى المَرْأَة الإعتداد بِالحَولِ فَبَيَّن الله تَعَالى فِي هَذِهِ الآيَة أَنَّ ذَلِكَ غَير وَاجِب)}، واتە: هۆی ئەمە کە خوای زاناو شارەزا ئەمەی نارده خوارێ، ئەوە بوو کە لە سەردەمی نەفامییدا وەسیەتیان دەکرد، کە دەبێ

---

١) (محاسن التأويل)، ج: (٢)، ص: (٢٩٣- ٢٩٤) .

ئافرەتەکە ساڵێکی تەواو بمێنێتەوەو نەفەقەی بکێشرێو ماوەی ئەو ساڵە تەواوەش ئافرەتەکە لەسەری پێویست بوو کە لەعیددەدا بێ، واتە: بەرگو پۆشاکی ئاسایی لەبەر نەکات، هەتاکو ساڵەکە تەواودەبێ، جا خوای بەرز لەم ئایەتەدا ڕوونی کردەوە، کە ژن ساڵێك چوونە عیددەی لەسەر پێویست نیە، بەڵکو شتێکی سوننەتەو پەسەندە، (تەنیا چوار مانگو دە شەوەکە فەرزە).

**مەسەلەی پازدەیەم:** ﴿ وَلِلْمُطَلَّقَٰتِ مَتَٰعٌۢ بِٱلْمَعْرُوفِ ۖ حَقًّا عَلَى ٱلْمُتَّقِينَ ﴾، ئەوە باسمان کرد کە مسوڵمان دەبێ هەم چاکەکاربێو هەم پارێزکاربێ، کەواتە: ئەگەر دەتەوێ چاکەکاربی، خوا هەر لەسەری پێویست کردووی، وە ئەگەر دەتەوێ پارێزکاربی خوا هەر لەسەری پێویست کردووی، دیارە پێچەوانەی چاکەکاریی خراپەکارییە،وە پێچەوانەی پارێزکاریی تاوانبارییەو هەردووکیشیان سزایان لەسەرە، واتە: خراپەکارییو تاوانباریی (الإساءة والفجور).

**مەسەلەی شازدەیەم:** خوا ﷻ کە دەفەرموێ: ﴿ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمْ ءَايَٰتِهِۦ لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ﴾، ئەوە زۆر ڕوونو ئاشکرایە کە بەهۆی ئایەتەکانی خواوە، کە خوا ڕوونی کردوونەوەو بەهۆی تێفکرینی ئایەتەکانو تەماشاکردنیانەوە، ئێمە عەقڵمان زیاد دەکاتو گەشە دەکاتو زیاتر تێدەگەینو شارەزا دەبین، خوای پەروەردگار لەو کەسانەمان بگێڕێ کە بەهۆی زیاتر لێ وردبوونەوەی کتێبی خواو تێگەیشتنیەوە، عەقڵو تێگەیشتنیان زیاد دەکات.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی پەنجاو یەکەمین

## پێناسەی ئەم دەرسە

لەم دەرسەماندا خوا پشتیوان بێت ئایەتەکانی ژمارە: (٢٤٣ تاکو ٢٥٢) لە سوورەتی (البقرة) دەتوێژینەوە، لەم دە ئایەتەدا، خوا تعالى دوو بەسەرهاتمان بۆ دەگێڕێتەوە لە گەلی بەنی ئیسرائیل، بەنی ئیسرائیل کە وەك پێشتر گوتوومانە، ئەو وەچەیەن کە لە یەعقووبی کوڕی ئیسحاقی کوڕی ئیبراهیم (علیهم الصلاة والسلام) وەپاش کەوتوون، جا لەبەرئەوەی ئێمە لەکاتی تەفسیرکردنی ئایەتەکاندا بەسەرهاتەکان دەگێڕینەوە، لێرە بەو ئاماژە کورتە وازی لێ دەهێنین.

﴿ أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ خَرَجُوا مِن دِيَارِهِمْ وَهُمْ أُلُوفٌ حَذَرَ الْمَوْتِ فَقَالَ لَهُمُ اللَّهُ مُوتُوا ثُمَّ أَحْيَاهُمْ ۚ إِنَّ اللَّهَ لَذُو فَضْلٍ عَلَى النَّاسِ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يَشْكُرُونَ ﴿٢٤٣﴾ وَقَاتِلُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿٢٤٤﴾ مَّن ذَا الَّذِي يُقْرِضُ اللَّهَ قَرْضًا حَسَنًا فَيُضَاعِفَهُ لَهُ أَضْعَافًا كَثِيرَةً ۚ وَاللَّهُ يَقْبِضُ وَيَبْسُطُ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴿٢٤٥﴾ أَلَمْ تَرَ إِلَى الْمَلَإِ مِن بَنِي إِسْرَائِيلَ مِن بَعْدِ مُوسَىٰ إِذْ قَالُوا لِنَبِيٍّ لَّهُمُ ابْعَثْ لَنَا مَلِكًا نُّقَاتِلْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ ۖ قَالَ هَلْ عَسَيْتُمْ إِن كُتِبَ عَلَيْكُمُ الْقِتَالُ أَلَّا تُقَاتِلُوا ۖ قَالُوا وَمَا لَنَا أَلَّا نُقَاتِلَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَقَدْ أُخْرِجْنَا مِن دِيَارِنَا وَأَبْنَائِنَا ۖ فَلَمَّا كُتِبَ عَلَيْهِمُ الْقِتَالُ تَوَلَّوْا إِلَّا قَلِيلًا مِّنْهُمْ ۗ وَاللَّهُ عَلِيمٌ بِالظَّالِمِينَ ﴿٢٤٦﴾ وَقَالَ لَهُمْ نَبِيُّهُمْ إِنَّ اللَّهَ قَدْ بَعَثَ لَكُمْ طَالُوتَ مَلِكًا ۚ قَالُوا أَنَّىٰ يَكُونُ لَهُ الْمُلْكُ عَلَيْنَا وَنَحْنُ أَحَقُّ بِالْمُلْكِ مِنْهُ وَلَمْ يُؤْتَ سَعَةً مِّنَ الْمَالِ ۚ قَالَ إِنَّ اللَّهَ اصْطَفَاهُ عَلَيْكُمْ وَزَادَهُ

بَسْطَةً فِي الْعِلْمِ وَالْجِسْمِ ۖ وَاللَّهُ يُؤْتِي مُلْكَهُ مَن يَشَاءُ ۚ وَاللَّهُ وَاسِعٌ عَلِيمٌ ﴿٢٤٧﴾ وَقَالَ لَهُمْ نَبِيُّهُمْ إِنَّ آيَةَ مُلْكِهِ أَن يَأْتِيَكُمُ التَّابُوتُ فِيهِ سَكِينَةٌ مِّن رَّبِّكُمْ وَبَقِيَّةٌ مِّمَّا تَرَكَ آلُ مُوسَىٰ وَآلُ هَارُونَ تَحْمِلُهُ الْمَلَائِكَةُ ۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَةً لَّكُمْ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿٢٤٨﴾ فَلَمَّا فَصَلَ طَالُوتُ بِالْجُنُودِ قَالَ إِنَّ اللَّهَ مُبْتَلِيكُم بِنَهَرٍ فَمَن شَرِبَ مِنْهُ فَلَيْسَ مِنِّي وَمَن لَّمْ يَطْعَمْهُ فَإِنَّهُ مِنِّي إِلَّا مَنِ اغْتَرَفَ غُرْفَةً بِيَدِهِ ۚ فَشَرِبُوا مِنْهُ إِلَّا قَلِيلًا مِّنْهُمْ ۚ فَلَمَّا جَاوَزَهُ هُوَ وَالَّذِينَ آمَنُوا مَعَهُ قَالُوا لَا طَاقَةَ لَنَا الْيَوْمَ بِجَالُوتَ وَجُنُودِهِ ۚ قَالَ الَّذِينَ يَظُنُّونَ أَنَّهُم مُّلَاقُو اللَّهِ كَم مِّن فِئَةٍ قَلِيلَةٍ غَلَبَتْ فِئَةً كَثِيرَةً بِإِذْنِ اللَّهِ ۗ وَاللَّهُ مَعَ الصَّابِرِينَ ﴿٢٤٩﴾ وَلَمَّا بَرَزُوا لِجَالُوتَ وَجُنُودِهِ قَالُوا رَبَّنَا أَفْرِغْ عَلَيْنَا صَبْرًا وَثَبِّتْ أَقْدَامَنَا وَانصُرْنَا عَلَى الْقَوْمِ الْكَافِرِينَ ﴿٢٥٠﴾ فَهَزَمُوهُم بِإِذْنِ اللَّهِ وَقَتَلَ دَاوُودُ جَالُوتَ وَآتَاهُ اللَّهُ الْمُلْكَ وَالْحِكْمَةَ وَعَلَّمَهُ مِمَّا يَشَاءُ ۗ وَلَوْلَا دَفْعُ اللَّهِ النَّاسَ بَعْضَهُم بِبَعْضٍ لَّفَسَدَتِ الْأَرْضُ وَلَٰكِنَّ اللَّهَ ذُو فَضْلٍ عَلَى الْعَالَمِينَ ﴿٢٥١﴾ تِلْكَ آيَاتُ اللَّهِ نَتْلُوهَا عَلَيْكَ بِالْحَقِّ ۚ وَإِنَّكَ لَمِنَ الْمُرْسَلِينَ ﴿٢٥٢﴾ ﴾.

## مانای وشە بە وشەی ئایەتەکان

ئایا سەرنجی ئەوانەت نەداوە کە بە هەزاران بوون‌و لەبیمی مردن لە ماڵەکانیان چوونەدەر، خواش پێی فەرموون بمرن! پاشان زیندووی کردنەوە، بێگومان خوا خاوەن چاکەیە بەسەر خەڵکەوە، بەڵام زۆربەی خەڵکی سوپاسگوزاریی ناکەن ﴿٢٤٣﴾ وە لە پێناوی خوادا بجەنگن‌و بزانن کە خوا بیسەری زانایە ﴿٢٤٤﴾ کێیە ئەو کەسەی دەستقەرز لەگەڵ خوادا بکات بە قەرزێکی باش، تاکو ئەویش بەچەند بەرانبەری

زۆر بۆی قەرەبوو بکاتەوە ! وە خوا (ڕۆزیی) وەتەنگ دێنێ‌و فراوانی دەکات‌و بۆ لای ویش دەگێڕرێنەوە ﴿٢٤٥﴾ ئایا سەرنجی قسە ڕۆیشتووانی بەنی ئیسرائیلت نەداوە لە پاش مووسا ! کە بە پێغەمبەرێکی خۆیانیان گوت: سەرکردەیەکمان بۆ دابنێ کە (لە ژێر سەرکردایەتییدا) لەڕێی خوادا بجەنگین ! گوتی: ئایا پێتان وا نیە کە ئەگەر جەنگتان لەسەر پێویست کرا، نەجەنگن ؟ گوتیان: جا چیمانە کە لەڕێی خوادا نەجەنگین ! لە حاڵێکدا کە لەنێو ماڵ‌و حاڵ‌و کوڕانمان وە دەرنراوین؟ بەڵام کاتێك جەنگیان لەسەر پێویست کرا، کەمێکیان نەبێ پشتیان کردەوە، وە خوا بە ستەمکاران زانایە ﴿٢٤٦﴾ وە پێغەمبەرەکەیان پێی گوتن: خوا طالووتی بەسەرکردە بۆ داناون ! گوتیان: جا چۆن دەبێ سەرکردەی ئێمە بێ لەحاڵێکدا کە ئێمە بۆ سەرکردایەتیی شایستەترین‌و سامانێکی فراوانیشی نەدراوەتێ ؟ گوتی: خوا ئەوی بەسەرتاندا هەڵبژاردوەو لە زانیاری‌و جەستەشدا زێدەیی پێداوە، وە خوا (دەستەڵات) فراوانی زانایە ﴿٢٤٧﴾ وە پێغەمبەرەکەیان پێی گوتن: بەڵگەو نیشانەی حوکمڕانییەکەی (واتە: حوکمڕانیی طالووت) ئەوەیە کە تابووتتان بۆ بێ، فریشتەکان هەڵی دەگرن، ئارامیی لە پەروەردگارتانەوە تێدایە، وێڕای پاشماوەیەك لەو شتانەی نزیکانی مووساو نزیکانی هاروون بەجێیان هێشتوون، بێگومان لەوەدا بەڵگەو نیشانەتان بۆ هەیە (لەسەر ڕاستیی طالووت) ئەگەر بڕواداربن ﴿٢٤٨﴾ جا کاتێك طالووت لەشکرەکەی (لە ئاوەدانی) جیاکردەوەو خستەڕێ گوتی: بێگومان خوا بە ڕووبارێك تاقیتان دەکاتەوە، جا هەرکەسێك لە لوێچێك زیاتری لێ بخواتەوە، ئەوە لە من نیە، وە هەرکەسێك لێی نەچێژێ ئەوە لە منە، ئنجا جگە لە کەمێکیان تێکڕا لێیان خواردەوە، جا کاتێك خۆی‌و ئەو بڕوادارانەی لەگەڵی بوون، لێی پەڕینەوە، گوتیان: ئەمڕۆ توانای پێ وێرانی جالووت‌و لەشکرەکەیمان نیە ! ئەوانەی کە دڵنیابوون لەوە کە بە دیداری خوا دەگەن، گوتیان: گەلێك جاران بە ویستی خوا کۆمەڵێکی کەم بەسەر کۆمەڵێکی زۆردا زاڵبوون، وە خوا لەگەڵ خۆڕاگران دایە﴿٢٤٩﴾ وە کاتێك بۆ جالووت‌و لەشکرەکەی چوونە مەیدانێ، گوتیان: پەروەردگارمان خۆڕاگرییمان بەسەردا بڕێژەو پێیەکانمان بچەسپێنەو بەسەر کۆمەڵی کافراندا سەرمان بخە ﴿٢٥٠﴾ئیدی بە

مۆڵەتی خوا شکاندنیانن‌و داوودیش جالووتی کوشت‌و خوا دەسەڵات‌و حیکمەتی پێداو، لەوەی کە دەیەوێ شارەزای کرد، وە ئەگەر خوا هەندێك لە خەڵكی بە هەندێکیانی لانەبردبایە، مسۆگەر سەرزەمین تێکدەچوو، بەڵام خوا خاوەن چاکەیە بەسەر جیهانییانەوە ﴿٢٥١﴾ ئا ئەوانە ئایەتەکانی خوان بەشێوەیەکی هەق بەسەرتیاندا دەخوێنینەوە، وە بێگومان تۆ لە ڕەوانەکراوانی ﴿٢٥٢﴾)).

## شیکردنەوەی هەندێك لە وشەكان

(**حَذَرَ**): (الحذَرُ: إحتِرازٌ مِنْ مُخِيفٍ)، واتە: (حَذَر) بریتییە لە خۆپاراستن لە شتێکی مەترسیی لێکراو کە جێگای ترس بێ.

(**لَذُو**): واتە: صاحب، خاوەن.

(**فَضْلٍ**): واتە: چاکە، (الفَضْلُ: الزِيادَة عَنِ الإقتصادِ خَيراً أو شراً وَفي المحمُودِ أكْثَرُ اسْتِعْمَالاً)، واتە: (فَضْلُ) زیادەیە لە چاکەدا، یان لە خراپەدا، وە لە چاکەدا زیاتر بەکاردێ، (لَذُ فَضْلٍ): واتە: خاوەن چاکەو خاوەن زیادە، چونکە (فَضْل) بریتییە لە چاکەیەکی زیادە کە دەبەخشرێ.

(**يُقْرِضُ**): (القَرْضُ: هُوَ مَا يُدفَعُ إلى الإنسانِ مِنَ الْمَالِ بِشَرْطِ رَدِّ بَدَلِهِ) وشەی (قَرْض) بریتییە لەوەی، کە دەدرێ بە کەسێك بە مەرجی ئەوەی، کە دوایی بدرێتەوە، یاخود جێگرەکەی بدرێتەوە، واتە: بارتەقای ئەوە بدرێتەوە بە خاوەنی.

(**أَضْعَافًا**): (أَضْعَافاً: جَمْعُ ضِعفٍ وَمَصْدَرَه: ضَعْف، وَضِعْفُ الشَّيءِ الَّذي يُثَنِّيهِ فَضِعْفُ الإثنينِ أربعَة)، وشەی (أضعَاف) کۆی (ضِعْف)ە، چونکە (أَضْعَاف) بە کوردی، واتە: چەند قات، (ضِعْفِ)یش واتە: دوو قات.

(**يَقْبِضُ**): (يَسْلُبُ، القَبْضُ: تَنَاوُلُ الشَيءِ بِجَميعِ الكَفِّ)، واتە: (يَقْبِض) یانی: دەستێنێ، وە (قَبْض) بریتییە لە گرتنی شتێك بە هەموو دەست، وە لێرەدا

مەبەست پێی لێگرتنەوەو كەمكردنەوەیە.

(وَيَبْصُۜطُ): (يُعْطِي، وَيَبسَطَ: نَشَرَه وَسَّعَ)، واتە: (يَبْسُط) یانی: دەبەخشێ، یان فراوان دەكات، وە (نَشَرَ وَوَسَّعَ)، واتە: بڵاوی كردەوەو فراوانی كرد.

(ٱلْمَلَإِ): (المـلأُ: جَماعَةٌ يَجْتَمِعُونَ عَلَى رَأْيٍ، فَيَمْلَؤُون العُيُونَ رِوَاءً وَمَنْظَراً، وَالنُّفُوسَ بِهَاءً وَجَلالاً وَالمَقصودُ بِهِ: سُراة القَوْمِ وَأَشرافه) واتە: (مَلأ) كە من بە دەست ڕۆیشتووان یان قسە ڕۆیشتووانم تەفسیر كردوە، واتە: (ملأ)ی هەر كۆمەڵێك ئەوانەن كە لەنێو خەڵكدا قسەیان دەڕواو دەستیان دەڕواو، ئەمرو نەهییان بەدەستە، لەوەشەوە هاتوە كە چاوی خەڵك پڕدەكەن لە ترس‌و سام‌و ڕێزو هەیبەت.

(ٱبْعَثْ): (أَصْلُ البَعْثِ: إِثَارَةُ الشَيءِ وَتَوجيهه) وشەی (بَعْث) بریتیە لە وروژاندنی شتێك، (وَقَولە تَعالی: ﴿ فَبَعَثَ ٱللَّهُ غُرَابًا يَبْحَثُ فِى ٱلْأَرْضِ ... ﴿٣١﴾ ﴾ المائدة، أي: قَيَّضَهُ)، واتە: ڕەوانەی كردو ئامادەی كرد (خوا ﷻ قەلەڕەشێكی نارد، زەوی بە دەندووكی دەكۆڵی).

(مَلِكًا): مەلیك واتە: پادشا، لێرەدا بەمانای فەرمانڕەواو سەركردە دێ، چونكە مەلیك لە (مُلْك)ەوە هاتوە، دەڵێ (المُلْكُ: هُوَ التَّصرُّفُ بالأَمْرِ والنَّهْي في الجمهُورِ، والمَلِكُ مَن يَملك السِّياسَة)، وشەی (مُلْك) بریتیە لە دەستكراوەیی لە هەڵسوكەوت كردن لەگەڵ خەڵكدا، مەلیك: واتە ئەو كەسەی كە سیاسەتی بەدەستە، حوكمڕان.

(ٱصْطَفَىٰهُ): (اصطَفاهُ)، (أَصْلُ الصَّفاء: خُلُوصُ الشَّيء مِنَ الشَّوْبِ، ومِنهُ: الصَّفا، للحِجارَةِ الصافيةِ، والإصطِفاءُ: تَنَاوُلُ صَفْوِ الشَّيء، كما أن الإختِيار: تَنَاوُلُ خَيْرِهِ)، وشەی (صَفاء) شتێكە كە خڵتەی پێوە نەمابێ، جا وشەی (الإصطفاء) واتە: خوڵاسەی شتێك‌و پوختەكەی وەربگری، وەك (إختِيار) یانی: چاكەكەی وەربگری.

(ٱلتَّابُوتُ ): واتە: (صندُوق) وشەی (تابوت) بریتیە لە هەرشتێك، كە شتی تێبخرێ.

(سَكِينَةٌ ): (السُّكُونُ: ثُبُوتُ الشَّيءِ بَعْدَ تَحَرُّكِ، والسَّكنُ وَالسَّكِينَةُ وَاحِدٌ، وَهُوَ زَوَالُ الرُّعْبِ، وعلى هذا قولهِ: ﴿أَن يَأْتِيَكُمُ ٱلتَّابُوتُ فِيهِ سَكِينَةٌ مِّن رَّبِّكُمْ﴾)، وشەی (السَّكِينَةُ) من بە (ئارامیی)م لێكداوەتەوە، چونكە لە (سُكُون)ەوە هاتوەو لە (سَكَنَ)ەوە هاتوە، وشەی (سَكَنَ) واتە: جێگیر بوو، یانی شتێك جووڵە جووڵی كرد بۆ دوایی لە جووڵە كەوتبێ، كە مەبەست پێی لاچوونی ترسە لە دڵداو لاچوونی دڵە ڕاوكێ یە.

(لَآيَةً ): (آیة: أي عَلامَةً وجَمْعُها آيات)، وشەی (آیة)، واتە: نیشانە، بەڵگە.

(غُرْفَةً ): (الغَرْفُ: رَفْعُ الشَّيءِ وَتَنَاوُلُهُ، يقالُ: غَرَفْتُ الماءَ وَالمَرَقَ، والغُرْفَةُ: ما يُغْتَرَفُ، و الغَرْفَةُ لِلْمَرَّةِ)، (غُرْفَة) بەمانای ژوور دێ، بەڵام لێرەدا بەمانای لوێچێك ئاو دێت، واتە پڕی یەك مستی یەك دەست، ئەوە وەك دوایی باسی دەكەین كە جالووت لەسەر سوپاكەی خۆی كردە مەرج كە بەس یەكی یەك لوێچ ئاو بخۆنەوە، هەر ئەوەندەی تێنوێتییان پێ بشكێ.

(يَظُنُّونَ ): لێرەدا بە مانای (يُوقِنون) یەقینیان هەیە دێت، بەڵام لە زۆر شوێنی دیكە لە قورئاندا بە مانای (يَشكّون، يَتَردَّدُون) گومانیان هەیە، دوو دڵن، هاتوە، جا (راغب) دەڵێ: (الظن: اسمٌ لِما يَحْصُلُ عَنْ أمارَةٍ، وَمَتَى قَوِيَتْ أدَّتْ إلى الْعِلْمِ، وَمَتَى ضَعُفَتْ جداً لَمْ يَتَجَاوَزْ حَدَّ التَّوَهُّمِ) واتە: (ظَن) بە هەر زانیارییەك دەگوترێ، كە لە ئەنجامی نیشانەكاندا پەیدا دەبێت، جا ئەگەر نیشانەكان زۆر بەقوەت بوون دەگاتە ڕاددەی زانستو یەقین، بەڵام ئەگەر نیشانەكان لاواز بوون، تەنیا دەبێتە جۆرێك لە گومان وەهەمو دوو دڵیی.

(فِئَةً ): (الفِئَةُ: الجَمَاعَةُ المُتَظَاهِرَةُ التي يَرْجِعُ بَعْضُهُمْ إلى بَعْضٍ في التّعاضُدِ) وشەی: (الفِئَةَ) واتە: كۆمەڵ، (راغب) دەڵێ: كۆمەڵێكن كە هەندێكیان دەگەڕێنەوە بۆ لای هەندێكیان، {چونكە (فاءَ) یانی: (رَجَعَ)}وە

پشت بە یەکەوە دەبەستن و پێکەوە تۆکمەو توندو تۆڵن.

(بَـرَزُواْ): (البَراز: الفضاء، و بَرَزَ: حَصَلَ في براز، و مِنهُ المبارَزَة للقِتالِ وَهيَ الظهُور مِنَ الصَف) وشەی (البَراز) بە مانای (فَضاء) دەشت، دێت. (بَـرَزوا)، واتە: بۆ یەك چوونە دەشت، بۆ یەك هاتنە مەیدان، چونکە دەڵێ (بَرَزَ: حَصَلَ في براز) واتە: چووە دەشتەوە، چووە مەیدانێ، (مُبارَزَة) یانی: بۆ یەکدی هاتنە مەیدان.

(أَفۡرِغۡ): (الفَراغُ: خِلافُ الشُّغْلِ) وشەی: (فَراغُ)، واتە: بۆشایی، پێچەوانەکەی بریتیە لە (شُغْل)، واتە: شتێك مەشغوول بکاو پڕ بکا، جا (إفَراغُ) دەڵێ: (و أفْرَغْتُ الدَّلْوَ: صَبَبْتُ ما فيهِ، و مِنهُ استُعيرَ: ﴿... رَبَّنَآ أَفۡرِغۡ عَلَيۡنَا صَبۡرٗا ... ١٢٦﴾ الأعراف، (الدَّلْوَ) واتە: دۆڵچە کە ئاویان پێ لە بیر هەڵهێنجاوە، (و أفْرَغْتُ الدَّلْوَ): یانی: هەرچی لە دۆڵچەکەدا بوو هەمووم هەڵڕشت، ﴿... رَبَّنَآ أَفۡرِغۡ عَلَيۡنَا صَبۡرٗا ... ١٢٦﴾ الأعراف ، واتە: تەواو ئارامییمان هەڵبڕێژە سەر دڵ و دەروون.

(بِإِذۡنِ ٱللَّهِ): (الإذنُ في الشَّيء: إعلامٌ بأجازَتِهِ و الرُخصَةِ فيهِ، الإِذنُ هُوَ الأرادَةُ و الأمر)، وشەی (إذْن الله) بەمانای ویستی خوا دێت، وە بەمانای فەرمانیش دێت، بەڵام لێرەدا بەمانای (ویست) لێکدەدرێتەوە.

(دَفۡعُ ٱللَّهِ): (الدَّفْعُ إذا عُدّيَ بِإلى اقتَضَى معنَى الإنالَةِ، نحو قوله تَعالىَ: ﴿... فَٱدۡفَعُوٓاْ إِلَيۡهِمۡ أَمۡوَٰلَهُمۡ ... ٦﴾ النساء ، وَإذا عُدّيَ بِعَنْ اقتَضَى معنَى الحِمايَة، نحو: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُدَٰفِعُ عَنِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ ... ٣٨﴾ الحج ، وَإذا عُدّيَ بالباءِ اقتضى معنَى الإزالَة التَنْحية، نحو: ﴿وَلَوۡلَا دَفۡعُ ٱللَّهِ ٱلنَّاسَ بَعۡضَهُم بِبَعۡضٖ﴾، وشەی (دَفْع)، واتە: پاڵ پێوەنان، (دَفْعُ الله) واتە: ئەگەر خوا بە

هەندێك لە خەڵك هێندێكی دیكەی پاڵ پێوە نەنابان، بە خەڵكێكی چاكەكار، خەڵكی ستەمكاری پاڵ پێوە نەنابایە، ئەوە دنیا تێكدەچوو، وشەی (دَفْع) ئەگەر بە (إلى) (تَعَدِّي) بكات مانای گەیاندن دەگەیەنێ، وەك ﴿ ...فَٱدْفَعُوٓاْ إِلَيْهِمْ أَمْوَٰلَهُمْ ... ﴿٦﴾ ﴾ النساء، واتە: جا ماڵەكانیان بدەنێ، وە ئەگەر بە (عَنْ) (تَعَدِّي) بكات مانای پاراستن و پەنادان دەگەیەنێ، ئەوە مانای لابردن دەگەیەنێ ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ يُدَٰفِعُ عَنِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ ... ﴿٣٨﴾ ﴾ الحج، واتە: خوا بە مسۆگەریی بەرگریی لەوانە دەكات كە ئیمانیان هێناوە، وە ئەگەر بە (ب) (تَعَدِّي) بكات، وەك ﴿ وَلَوْلَا دَفْعُ ٱللَّهِ ٱلنَّاسَ بَعْضَهُم بِبَعْضٍ ﴾.

(﴿ لَّفَسَدَتِ ٱلْأَرْضُ ﴾): (الفَسَادُ: خُرُوجُ الشّيءِ عَنِ الإعتِدَالِ و يُضادُّهُ الصَّلاحُ)، وشەی (فَسَاد) بریتیە لەوە كە شتێك حاڵی تێكبچێ و لە حاڵەتی هاوسەنگیی دەربچێ، پێچەوانەكەی بریتیە لە چاكبوون (صَلَاح).

## مانای گشتی ئایەتەكان

خوای پەروەردگار لێرەدا دوو بەسەرهاتمان بۆ دەگێڕێتەوە، ئنجا دیارە كە دەفەرموێ: ﴿ أَلَمْ تَرَ ﴾، ڕووی قسەكردن لەگەڵ پێغەمبەرە ﷺ، یاخود لەگەڵ هەركەسێك كە قورئان بخوێنێت ﴿ أَلَمْ تَرَ ﴾، مانا ڕواڵەتییەكەی: ئایا نەتبینی، بەڵام مەبەست پێی (ألم تَعْلَمَ)ە، {ئایا نەتزانی !}ە، یاخود ئایا تەماشا ناكەی ! وە مەبەست لە تەماشاكردن تەماشاكردنی بەعەقڵ و بە دڵە، ئایا سەرنج نادەی! ئنجا سەرەتا دێتە سەر گێڕانەوەی بەسەرهاتی یەكەم و دەفەرموێ: ﴿ أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ خَرَجُواْ مِن دِيَٰرِهِمْ ﴾، كە زۆر بەكورتی لە یەك ئایەتدا دەیگێڕێتەوە، دەفەرموێ: ئایا سەرنجی ئەوانە نادەی لە ماڵ وحاڵی خۆیان وەدەركەوتن ﴿ وَهُمْ أُلُوفٌ ﴾، لە حاڵێكدا ژمارەیان بە هەزاران بوو، وەدەركەوتن ماڵ وحاڵ و نیشتیمانی

خۆیان بۆچی بەجێهێشت؟ ﴿ حَذَرَ ٱلۡمَوۡتِ ﴾، لە ترس و بیمی مردن ﴿ فَقَالَ لَهُمُ ٱللَّهُ مُوتُواْ ﴾، خواش پێی فەرموون: بمرن! ئەوان لە ترسی مردن ماڵوحاڵی خۆیان بەجێ هێشت، کەچی خوا ﷻ پێی فەرموون: بمرنو هەمووی مراندن ﴿ ثُمَّ أَحۡيَٰهُمۡ ﴾، وە پاشان زیندووی کردنەوە ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَذُو فَضۡلٍ عَلَى ٱلنَّاسِ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَشۡكُرُونَ ﴾، بێگومان خوا خاوەن چاکەو بەخششە، بەسەر خەڵکییەوە، بەڵام زۆربەی خەڵکی سوپاسگوزار نین.

ئەم بەسەرهاتە کە خوای بەرزو مەزن ئاوا زۆر بە کورتیی بە پوختیی بۆمان دەگێڕێتەوە، لە تەفسیرەکاندا زۆر شتیان لەسەر گوتوە، هەندێك دەڵێن: ئەوانە خەڵکێکی زۆربوون، میللەتێك بوون، کە خوا دەفەرموێ بە هەزاران کەس بوون، بیستوویانە کە نەخۆشییەك بڵاودەبێتەوە، طاعوون بووە، نەخۆشییەکی کوشندە بووە، ئەوان ئەو وڵاتەی خۆیان بەجێهێشتوە، بەڵام دوایی لە ئەنجامی بەجێهێشتنی وڵاتی خۆیاندا، نەخۆشییەکە لەنێویاندا بڵاوبۆتەوەو هەموویان وەفاتیان کردوە، دواییش خوای ژیێنەر زیندووی کردوونەتەوە، بۆ ئەوەی ببنە جێگەی پەندو عیبرەت بۆ خەڵك، کە جاری وا هەیە خەڵك لە ئەنجامی ڕاکردن لە مردندا تووشی مردن دەبێت!

وە هەندێك دەڵێن: نا، بەڵکو ئەوانە خەڵکێك بوون، میللەتێك بوون بیستوویانە کە دوژمن هاتوە بەسەریاندا بداتو لە ترسی دوژمن ماڵوحاڵو نیشتیمانی خۆیان بەجێهێشتوە، بەڵام لە ئەنجامدا هەموویان کوژراون، دوایی خوای توانا زیندووی کردوونەتەوە، کەواتە: لەجیاتی ڕاکردن، بەرهەڵستیی بکەن، چونکە مەرج نیە لە بەرهەڵستییدا تووشی کوژرانو برینداربوون ببی، بەڵکو جاری وا هەیە لە ڕاکردندا تووشی بەڵاو کوژران دەبی، هەرچۆن بێ خوای زانا ئەوە بە کورتی دەگێڕێتەوەو تەفسیرەکان تەفصیلاتی زۆریان لێ باسکردوە، بۆ ئەوەی بۆ ئێمەی مسوڵمان ببێتە جێی پەندو عیبرەت، کە مەرج نیە ئینسان لە مانەوە لە سەنگەرداو لە بەرهەڵستییدا تووشی کوژران بێت، بەڵکو زۆرجار لە ڕاکردنداو لە هەڵاتندا تووش دەبێت، وەك کوردەواریی خۆشمان دەڵێت: (ئەوەی بترسێ ناخەلسێ).

ئنجا دوایی فەرمان بە جەنگو جیهاد دەکاتو دەفەرموێ: ﴿وَقَٰتِلُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱعْلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾، وە لەڕێی خوادا بجەنگن، وە بزانن کە خوا بیسەری زانایە، واتە: لە مردنێ مەترسێنو لە دوژمن مەترسێنو لەڕێی خوادا بجەنگن، وە بشزانن کە خوا بیسەرە دەنگتان دەبیستێو زاناشە ئاگاداری حاڵو باڵتانە، لەجیاتی ئەوەی بیرکەنەوە لە ڕاکردنو هەڵاتنو خۆشاردنەوە، بیربکەنەوە لە خۆڕاگریىو لە بەرهەڵستییو لە فیداکاریی، جا لە ئەنجامی ئەوەدا کە جیهادو بەرەنگاریی بەبێ ماڵ بەخشین نابێ، ئنجا خوا ﷻ باسی ماڵ بەخشین دەکاتو دەفەرموێ: ﴿مَّن ذَا ٱلَّذِي يُقْرِضُ ٱللَّهَ قَرْضًا حَسَنًا﴾، کێ هەیە قەرزێکی باش بداتە خوا ﷻ؟، (قەرزی باش دانە خوا یانی چی؟! یانی: ماڵەکەی ببەخشێ لەو شوێنەدا کە شەرع بۆی دیاری کردوە، لە بەرژەوەندیی خەڵکدا، بەڵام پاداشتەکەی تەنیا لە خوا بووێتەوەو با دڵنیابێ، کە خوای بەخشەر چاکترین پاداشتی دەداتەوە. ﴿فَيُضَٰعِفَهُۥ لَهُۥٓ أَضْعَافًا كَثِيرَةً﴾، خوا بەچەند قات بۆی قەرەبوو دەکاتەوەو، ئەوە نیە کە چەندەی بەخشیوە هەر ئەوەندەی بداتەوە لە دوارۆژدا، بەڵکو بەچەند قاتی زۆر بۆی قەرەبوو دەکاتەوە ﴿وَٱللَّهُ يَقْبِضُ وَيَبْصُۜطُ﴾، وە خوا ڕزق تەنگ دەکاتو فراوانیشی دەکات، بۆ هەندێکیان کەمی دەکاتو بۆ هەندێکیان زۆری دەکات، بەپێی حیکمەتی خۆی، ئەوەی کە ژیانی تەنگو ڕزقو ڕۆزی کەم دەکات تاقی دەکاتەوە، بزانێ داخۆ چی دەکات؟ وە ئەوەی کە ڕۆزیی بۆ فراوان کردوە بزانێ داخۆ ئەو ڕزقەی کە خوا پێی داوە، ئایا لە بەرژەوەندیی خەڵکداو لە بەرژەوەندیی کۆمەڵگاو دەوروبەریدا بەکاری دێنێت، وە پاداشتەکەی لە خوا بوێ، یان هەر بۆخۆی سوودی لێدەبینێو هەر پەزمەندەی دەکاتو هەر خەریکی ژماردنی دەبێت، هەردووکیان تاقی دەکرێنەوە ﴿وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ﴾، وە بۆ لای وی دەگێردرێنەوە. واتە بۆ لای خوا دەچنەوە، تاکو ئەنجامی ئەو تاقیکردنەوە بە تەنگدەستییو بە فراوان دەستیی، بە هەژارییو بە دەوڵەمەندیی، وەربگرنەوە.

ئنجا دێتە سەر بەسەرهاتی دووەم، کە پانتاییەکی باشی ئەو ئایەتە بەپێزانەی بۆ تەرخان کراوەو بە بەسەرهاتی طالۆوتو جالۆوت ناوی دەرکردوە، لەبەر ئەوە کە سەرکردەی ئەو ئیماندارانەی کە جەنگیان کردوە ناوی طالۆوت بووەو، سەرکردەی کافرەکانیش ناوی جالۆوت بووەو، هەردووکیشیان ناوەکەیان لە قورئاندا هاتوە، وە لە کتێبەکانی مێژوودا[1] و لە تەفسیرەکاندا زۆر وردەکاریی‌و تەفصیلات لەبارەی ئەو بەسەرهاتەوە هاتوە، کە ئێمە تەنیا ئاماژە بە کەمێکی دەکەین، کە لەگەڵ ڕووحی ئایەتەکاندا بگونجێ، خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى الْمَلَإِ مِنْ بَنِي إِسْرَائِيلَ مِنْ بَعْدِ مُوسَى﴾ ، ئایا سەرنجی قسە ڕۆیشتووانی وەچەی ئیسرائیل نادەی، واتە: ئەوانەی کە لەنێو وەچەی ئیسرائیلدا قسە ڕۆیشتوو بوون‌و شتیان بەدەست بوو، سەرپەرشتی وەچەی ئیسرائیلیان دەکرد، لە دوای مووسا ؑ، واتە: ئەو بەسەرهاتە لە دوای مووسا ؑ ڕوویداوە، چییان گوت: ﴿إِذْ قَالُوا لِنَبِيٍّ لَهُمُ ابْعَثْ لَنَا مَلِكًا نُقَاتِلْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ﴾، کاتێک کە بە پێغەمبەرێکی خۆیانیان گوت: پادشایەکمان بۆ بنێرە، سەرکردەیەکمان بۆ دیاری بکە، تاکو لە ڕێگای خوادا جەنگ‌و جیهاد بکەین، ئەوانە دیارە لێ قەوماو بوون‌و دوژمن پێشتر زەبری لێداون‌و تووشی شکست‌و ناڕەحەتیی بوون، بۆیە داوایان لە پێغەمبەرەکەی خۆیان کردوە کە فەرماندەیەک، سەرکردەیەکیان بۆ دیاری بکات، بۆ ئەوەی لەژێر سەرکردەیێتی ئەودا جەنگ‌و جیهاد بکەن ﴿قَالَ هَلْ عَسَيْتُمْ إِنْ كُتِبَ عَلَيْكُمُ الْقِتَالُ أَلَّا تُقَاتِلُوا﴾، پێغەمبەرەکەیان ﷺ کە ناوەکەی لە قورئاندا نەهاتوە، بەڵام مێژوونووسان ناویان بردوە، بەس ئێمە هەر لە خۆوە نایڵێین، لەبەرئەوەی ناوی لە قورئاندا نەهاتوە پێغەمبەرەکەیان پێی گوتن: ئایا

---

١) لە (پەیمانی کۆن)دا باسی ئەو جەنگەی نێوان سوپای طالووت‌و جالۆوت کراوە، بەڵام (طالوت) بە (شاول)و (جالوت)یش بە (جُليات) ناویان هاتوەو (داود)یش هەروەک خۆی، بڕوانە:

(التفسير التطبيقي للكتاب المقدّس) (العهد القديم)، صموئيل الأول: الإصحاح: (١٧)، ص: (٥٩٨، ٥٩٩)، (جُليات يتحدّى جيش شاول).

نزیك نیە كە ئەگەر جەنگتان لەسەر پێویست بكرێ جەنگ نەكەن‌و پاشەكشە بكەن، ئەوە جارێ خوا لەسەری پێویست نەكردوون، بەڵام باشە ئەدی ئەگەر جەنگی لەسەر پێویست كردن، پاشەكشە ناكەن؟ ﴿قَالُواْ وَمَا لَنَآ أَلَّا نُقَٰتِلَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾، گوتیان: جا باشە بۆ لە ڕێی خوادا تێنەكۆشین، بۆ جەنگ ناكەین؟! ﴿وَقَدۡ أُخۡرِجۡنَا مِن دِيَٰرِنَا وَأَبۡنَآئِنَا﴾، لە كاتێكدا ئێمە لە ماڵ‌وحاڵ‌و خۆمان لە نیشتیمانی خۆمان وەدەرنراوین، وە لەنێو كوڕو منداڵەكانمان وەدەرنراوین‌و لە یەك جیاكراوینەوە ؟! وا دیارە خێزان‌و منداڵیان‌و، بە دیلگیراوە، واتە: نە ماڵمان ماوە، نە منالّمان ماوە، نە حاڵمان ماوە، بۆچی جەنگ نەكەین‌و بەرگریی نەكەین؟! ﴿فَلَمَّا كُتِبَ عَلَيۡهِمُ ٱلۡقِتَالُ تَوَلَّوۡاْ إِلَّا قَلِيلٗا مِّنۡهُمۡ﴾، بەڵام كاتێك جەنگیان لەسەر پێویست كرا، جگە لە كەمێكیان، ئەوانی دیكە هەموو پشتیان كردەوە، واتە: ئامادە نەبوون بچن بۆ ئەو جەنگ‌و جیهادە، ﴿وَٱللَّهُ عَلِيمُۢ بِٱلظَّٰلِمِينَ﴾، وە خوا بە ستەمكاران زانایە، كەواتە: ئەوانە ستەمكارن كە پێشێ قسەی گەورە گەورە دەكەن‌و، دوایی كە دێتە سەر ئەوەی پێویست بێ شان بدەنە بەرێ، پشت دەكەنەوە شان لەبن باری بەرپرسیارێتی دێننەدەرێ، واتە: پاش ئەوەی پێغەمبەرەكەیان ﷺ فەرمووی: ئەوە مۆڵەتم لە خوا وەرگرتووەو دەفەرموێ: باشە ئەوە جەنگیان لەسەر فەرزبووە، فەرموو با بچن، بەڵام هەر لەگەڵ جەنگ فەرز بوو، جگە لە كەمێكیان زۆرینەیان پشتیان هەڵكردو گوتیان: ئێمە ئامادەنین، ﴿وَقَالَ لَهُمۡ نَبِيُّهُمۡ﴾، ئنجا پێغەمبەرەكەیان ﷺ پێی فەرموون: واتە: بەو كەمینەیان كە لەسەر قسەی خۆیان مابوونەوەو ئامادەی جەنگ‌و جیهاد بوون: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ قَدۡ بَعَثَ لَكُمۡ طَالُوتَ مَلِكٗا﴾، بێگومان خوا طالوتی بە پادشاو سەركردە بۆ ناردوون، بەڵام لەوەشدا دیسان ملەجیڕەیان كرد ﴿قَالُوٓاْ أَنَّىٰ يَكُونُ لَهُ ٱلۡمُلۡكُ عَلَيۡنَا﴾، گوتیان: جا چۆن دەبێ ئەو پادشای ئێمە بێ‌و چۆن دەبێ ببێتە برا گەورەو سەركردەی ئێمە؟ ﴿وَنَحۡنُ أَحَقُّ بِٱلۡمُلۡكِ مِنۡهُ﴾، لە حاڵێكدا ئێمە شایستەترین، دیارە ئەو

طالووتە، یان کوڕە شوانێك بووە، یان کوڕە جوتیارێك بووە، یان کوڕە نەدارێك بووە، ئەوانیش، دیارە لەوانە بوون لەو عائیلانەو بنەماڵانە بوون کە ناسراو بوون، یاخود بە میرات سەرپەرشتیکردنی بەنی ئیسرائیلیان بۆ ماوەتەوە، وەك هەندێ بنەماڵەکانی: مەلاو بەگو ئاغاو شێخو... هتد، ﴿وَلَمْ يُؤْتَ سَعَةً مِّنَ الْمَالِ﴾، وە ماڵو سامانێکی فراوانیشی پێنەدراوە، ﴿قَالَ﴾، پێغەمبەرەکەیان ﷺ پێی فەرموون: ﴿إِنَّ اللَّهَ اصْطَفَاهُ عَلَيْكُمْ وَزَادَهُ بَسْطَةً فِي الْعِلْمِ وَالْجِسْمِ﴾، خوا لەنێو ئێوەدا هەڵیبژاردوە، وە فراوانییشی پێداوە لەڕووی زانستەوەو لە ڕووی جەستەوە، واتە: بەهێزی دەروونییو جەستەیی دەتوانێ ئەو کارە بکات ﴿وَاللَّهُ يُؤْتِي مُلْكَهُ مَن يَشَاءُ﴾، وە خوا بە هەر کەسێك کە بیەوێ موڵکی خۆی، وە دەستەڵاتی سەرپەرشتیکردنی خەڵك، دەبەخشێ ﴿وَاللَّهُ وَاسِعٌ عَلِيمٌ﴾، وە خوا فراوانی زانایە، واتە: دەستەڵاتی فراوانی هەیەو بەخششی فراوانی هەیە، وە زاناشەو دەزانێ کێ دەکات بەچی، وە بەرپرسیارێتی بە کێ دەسپێرێ ؟ ئنجا بەنی ئیسرائیل عادەتیان وا بووە، وە میللەتانی پێشوو هەموو عادەتیان وا بووە، کە موعجیزەی بەر هەستو بەرچاویان هەبێت، بۆیە پێغەمبەرەکەیان ﷺ دیارە داوا دەکات لە خوای باڵادەست کە طالووت نیشانەیەکی هەبێت، کە ئەو خەڵکە قەناعەتی پێ بکەن، کە ئەوە سەرکردەیەو لەلایەن خواوە دیاریکراوە، دەفەرموێ: ﴿وَقَالَ لَهُمْ نَبِيُّهُمْ إِنَّ آيَةَ مُلْكِهِ أَن يَأْتِيَكُمُ التَّابُوتُ فِيهِ سَكِينَةٌ مِّن رَّبِّكُمْ وَبَقِيَّةٌ مِّمَّا تَرَكَ آلُ مُوسَىٰ وَآلُ هَارُونَ﴾، وە پێغەمبەرەکەیان پێی فەرموون: نیشانەی پادشایەتیو حوکمڕانێتی طالووت ئەوەیە کە تابووتتان بۆ بێ، ئەو تابووتە هەم سەکینەتو ئارامیی تێدایە لە پەروەردگارتانەوەو، هەم چەند شوێنەوارێك کە نزیکانی مووساو نزیکانی هارون بەجێیان هێشتوون، دەڵێن: هەندێ پارچەی لەوح، ئەو لەوحەی کە تەوراتی لێ نوسرابۆوە بۆ مووسا، وە هەندێ پارچەی گۆچان، وە هەندێ شت کە هی شوێنەواری هارون بوون

(صەڵاتو سەلامی خوایان لەسەر بێ) کە مابوونەوە لەنێو بەنی ئیسرائیلدا، ئەوانە لەنێو ئەو تابووتەدا بوون، ئنجا: ﴿ تَحۡمِلُهُ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ ﴾ ئەو تابووتەش مەلائیکەت هەڵیاندەگرت، دیارە دەبێ ئەو تابووتەش بە ڕواڵەت بۆخۆی ڕۆیشتبێ، چونکە مەلائیکەت نابینرێن، واتە: فریشتەکان هەڵیان گرتبێ، بێ ئەوەی پێویست بەوە بکات، کە خەڵك هەڵیگرێ ﴿ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةٗ لَّكُمۡ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ ﴾، بەڕاستی لەوەدا نیشانە هەیە بۆ ئێوە ئەگەر ئیماندداربن، واتە: نیشانە هەیە لەسەر ئەوە کە طاڵووت خوا لێی ڕازی بێ سەرکردەیەکە خوای پەروەردگار ناردوویەتیو، دیاریی کردوە بۆ ئەوەی چاك بەقسەی بکەن، ئنجا دیارە ئەوانەش کە ڕەخنەیان دەبێ لە فەرماندەیتی طاڵووت، ئەوانەش تەنیا هەردەکشێنەوە، ئەوانە دەمێننەوە کە قەناعەتیان پێیەتی ﴿ فَلَمَّا فَصَلَ طَالُوتُ بِٱلۡجُنُودِ ﴾، ئنجا طاڵووت لەشکرەکەی پێش خۆی دەدا، یاخود پێشیان دەکەوێ، جا کاتێك طاڵووت سەربازەکانی جیادەکاتەوە لە ئاوەدانیو ڕوویان پێ لە دوژمن دەکات: ﴿ قَالَ إِنَّ ٱللَّهَ مُبۡتَلِيكُم بِنَهَرٖ ﴾، پێیان دەڵێ: خوا ئێوە تاقی دەکاتەوە بە ڕووبارێك، واتە: ڕووبارێکتان دێتە پێش، دوای ئەوەی کە زۆر تینوو بوونو زۆر شەکەت بوون، نابێ لەو ڕووبارە بخۆنەوە جگە لە لوێچێك، واتە: دەبێ هەر ئەوەندە بخۆنەوە کە تینوێتیتان پێ بشکێ، وەك دەفەرموێ: ﴿ فَمَن شَرِبَ مِنۡهُ فَلَيۡسَ مِنِّي وَمَن لَّمۡ يَطۡعَمۡهُ فَإِنَّهُۥ مِنِّيٓ إِلَّا مَنِ ٱغۡتَرَفَ غُرۡفَةَۢ بِيَدِهِۦۚ ﴾، جا هەرکەسێك لێی بخواتەوە لە من نیە، واتە: هەرکەسێك تێری لێ خواردەوە، با هەر لە ڕێوە بگەڕێتەوە، وە ئەوەی لێی نەخواردەوە جگە لە لوێچێك، ئەوە لە منەو با بمێنێتەوە، ئەگەرنا ئەوی دیکە لە من نیەو دەبێ بگەڕێتەوە ﴿ فَشَرِبُواْ مِنۡهُ إِلَّا قَلِيلٗا مِّنۡهُمۡۚ ﴾، ئنجا هەموو لێیان خواردەوە جگە لە کەمێکیان، کەواتە: ئەو کەمەش لە کەمێکی دیکەو لە کەمێکی دیکە یانی: جار بۆ جارێ لە بێژینگ دراون! ﴿ فَلَمَّا جَاوَزَهُۥ هُوَ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَعَهُۥ ﴾، جا کاتێك لە ڕووبارەکە تێپەڕی خۆیو ئەوانەی ئیمانیان

هێنابووو لەگەڵیدا بوون ﴿ قَالُواْ لَا طَاقَةَ لَنَا ٱلۡيَوۡمَ بِجَالُوتَ وَجُنُودِهِۦ ﴾، ئەو کەمە کەمەش کە مابوونەوە لەگەڵی کاتێك کە جاڵووتیان بینی، گوتیان: ئەمڕۆ ئێمە بە جاڵووتو سەربازەکانی ناوێرینو با ڕووبەڕوویان نەبینەوە، دیارە بەشێکیان، یان هەندێکیان وایانگوتوە ﴿ قَالَ ٱلَّذِينَ يَظُنُّونَ أَنَّهُم مُّلَٰقُواْ ٱللَّهِ ﴾، بەڵام ئەوانەیان کە یەقینیان هەبوو بەدیداری خوا دەگەن، یاخود ئەگەر (ظَن) بەمانای گومان بێ، نەك عیلم، یانی: ئەوانەی کە گومانیان وابوو شەهید دەبن، واتە: بۆ شەهیدیی هاتبوونو لە مردنێ نەدەترسان، چونکە وەك پێشتر گوتمان: وشەی (ظَن) هەم بە مانای (یقینو علم) دێ، وە هەم بە مانای گومانیش، ئەوانە گوتیان: ﴿ كَم مِّن فِئَةٖ قَلِيلَةٍ غَلَبَتۡ فِئَةٗ كَثِيرَةَۢ بِإِذۡنِ ٱللَّهِ ﴾، گەلێك جاران کۆمەڵێکی کەم بەسەر کۆمەڵێکی زۆردا بە فەرمانی خواو بە ویستی خوا، زاڵبوون ﴿ وَٱللَّهُ مَعَ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴾، خواش لەگەڵ خۆڕاگران دایە، کەواتە: با لێیان نەترسین ﴿ وَلَمَّا بَرَزُواْ لِجَالُوتَ وَجُنُودِهِۦ ﴾، وە کاتێك بۆ جاڵووتو سوپاکەی، چوونە مەیدانێو ڕووبەڕووی یەك بوونەوەو، سەفیان بەست بەرانبەر یەك، ﴿ قَالُواْ رَبَّنَآ أَفۡرِغۡ عَلَيۡنَا صَبۡرٗا وَثَبِّتۡ أَقۡدَامَنَا وَٱنصُرۡنَا عَلَى ٱلۡقَوۡمِ ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴾، پاڕانەوەو گوتیان: پەروەردگارمان ئارامییمان هەڵڕژێنە سەر دڵ {وەك چۆن گۆزەیەك ئاو هەڵدەڕێژی، ئاوا ئارامیی ئۆخژنمان هەڵڕژێنە سەر دڵ} و پێیەکانمان بچەسپێنە، وە بەسەر دوژمندا سەرمان بخە، کەواتە: سێ شتیان داواکردوون: (صَبر)و (ثَبات)و (نَصر)، واتە: ئارامیيو چەسپاویيو سەرکەوتن، دیارە هەرکەسێك خۆڕاگربێ، دامەزراویش دەبێت، وە هەرکەسێکیش دامەزراو بێو پشت لە دوژمن نەکات، سەرەنجام دوژمن دەبەزێنێ، ئیدی سەرەنجام ﴿ فَهَزَمُوهُم بِإِذۡنِ ٱللَّهِ وَقَتَلَ دَاوُۥدُ جَالُوتَ ﴾، بە ویستی خوا شکاندیانن، وە داوودیش {کە سەربازێك بوو لە سەربازەکانی طاڵووت، وە هەتا ئێستا ناوی نەهاتوە} جاڵووتی کوشت، جا توێژەرەوانی قورئانو مێژوونووسان زۆر بە تەفصیل چۆنیەتی کوژرانی

جالووتیان بە دەستی داوود باس کردوەو کورتەکەی ئەوەیە کە: داوود شوان بوو، کە بیستی ئەو سوپایە دەیەوێ بچێتە شەڕ لەگەڵ سوپای (عَمالِقة)و جالووت، گوتی: منیش دێم، گوتیان: ئاخر تۆ هەر شوان بووی‌و شەڕێ نازانی ! گوتی: با بێم کەلێنێکتان بۆ دەگرم، گوتیان: ئاخر تۆ لە مەسەلەی شەڕو تیرو ئەوانە نازانی، گوتی: بە هەرحاڵ دێم، گوتیان تۆ بەچی شەڕێ دەکەی؟ گوتی: بەو قۆچەقانییە (مِقلاع)ە، {قۆچەقانی شتێکە بەردی پێ دەهاوێشترێ‌و بەردەقانیشی پێ دەڵێن}، ئنجا داوود دوو سێ بەردی هەڵگرتن، وە جالووت داوای مەیدانداریی کرد، جالووت کە دەڵێن: زۆر پیاوێکی ئازاو بەهێز بووە، داوای کرد گوتی: ئەی طالووت بۆم وەرە مەیدانێ، یان یەکێکم بۆ بنێرە ! طالووتیش داوای لە سوپایەکەی کرد، گوتیان: بۆ جەنگی ئەو کابرایە کەس لە خۆیڕانابینێ، طالووتیش بە هەرحاڵ دیارە بە بەرژەوەندیی نەزانیوە کە خۆی بچێ، جا لە کتێبەکاندا دەڵێ[1]: داوود جەستەی بچووك بووەو بێهێز بووە، بەڵام من پێم وایە هیچی وا نیە، چونکە سەرجەم پێغەمبەرانی خوا (علیهم الصلاة والسلام) لە هەموو ڕوویەکەوەو لە ڕووی جەستەشەوە تێروتەواو بوون‌و بەتین‌و تاقەت بوون،بەڵام من پێم وایە بۆیە وایانگوتوە تاکو زیاتر ئەوە پێشان بدەن، کە داوود چەند بەشێوەیەکی موعجیزە ئاسا جالووتی کوشتوە ! ئنجا داوود گوتی: ڕاوەستێ من بۆی دەچم‌و مۆڵەت لە طالووت دەخوازێ‌و دەڵێ: منی بۆ ئیزن بدە، دەڵێ: ئاخر تۆ شەڕت بۆ دەکرێ ؟! دەڵێ: بەڵێ من شوان بووم ڕۆژێك[2] کوشتو دوایی سەرەکەیشم هەڵقەند، دەڵێ: ئاخر گورگ شتێکی وا نیە ! دەڵێ: ڕۆژێکی دیکە شێرێکم بۆ هات هەردوو

---

١) بۆ وردەکاریی جەنگی نێوان داوودو جالووت بڕوانە: سەرچاوەی پێشوو، ص: (٦٠٢، ٦٠٣) (داود تيأهب لملاقاة جُلْيات)، (داود يتحدَّى جُلْيات) شایانی باسیشە کە (پەیمانی کۆن)یش هەر دەڵێ: داوود جالووتی بە قۆچەقانیی کوشتوەو پێم وایە توێژەرەوانیش ئەو وردەکارییانەیان هەر لەو سەرچاوانەوە وەرگرتوە، چونکە لە تەفسیرەکاندا باسی ئەوەش کراوە کە طالووت ڕازی نەبووە، داوود بۆ جالووت بچێتە مەیدان هەتا داوود بۆی باسکردوە کە چۆن لەکاتی شوانیی دا شێرێك‌و ورچێکی کوشتوە ! جا ئەمەش لە (پەیمانی کۆن)دا هەر هاتوە !.

٢) (پەیمانی کۆن) باسی کوشتنی گورگی تێدانیە، بەڵام باسی شێرو ورچی تێدایە.

شەویلاگەیم گرتو لێکم هەڵقەڵاشت، دەڵێ: دە مادام وابێ شەڕت بۆ دەکرێ، بە هەرحاڵ بۆی دەچێتە مەیدانو دەڵێ جالووت پێی دەڵێ: بۆچی تۆیان ناردوە، بڕۆوە تۆ ناکوژم! داوودیش دەڵێ: ئاخر من تۆ دەکوژم، ئەویش تووڕە دەبێتو بۆی دێت، داوودیش قۆچەقانی لێ هەڵدەسووڕێنێ بەردێکی لە عەینی نێوچەوانی دەداتو دەچێتە نێو دەماغیو جالووت دەکوژێ، وە سوپایەکەی دەشکێو بەسەریاندا زاڵ دەبن ﴿ وَءَاتَىٰهُ ٱللَّهُ ٱلْمُلْكَ وَٱلْحِكْمَةَ ﴾، وە خوا پاداشایەتیو حیکمەتی پێبەخشی ﴿ وَعَلَّمَهُۥ مِمَّا يَشَآءُ ﴾، وە لەوەی کە بۆ خۆی ویستی فێری کرد ﴿ وَلَوْلَا دَفْعُ ٱللَّهِ ٱلنَّاسَ بَعْضَهُم بِبَعْضٍ لَّفَسَدَتِ ٱلْأَرْضُ ﴾، وە ئەگەر خوا هەندێك لە خەڵکی (خراپ)ی بە هەندێك خەڵکی (باش) پاڵ پێوەنەنابان، سەر زەوی تێکدەچوو، کەواتە: سەر زەوی لە ئەنجامی ئەوەدا کە ئەهلی هەق ئامادەن فیداکاریی بکەن لە پێناوی هەقداو، لە بەرانبەری ستەمکاراندا، لە ئەنجامی ئەوەدا سەر زەمین دەمێنێتەوە، ئەگەرنا هەمووی بەسەر خراپەو ستەم دەگەڕێ، لە ئەنجامی دەستەڵاتی دیکتاتۆرانەی ستەمکاراندا ﴿ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ ذُو فَضْلٍ عَلَى ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾، بەڵام خوا خاوەنی بەخششە بەسەر جیهانییانەوە، وە لە کۆتاییدا خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ تِلْكَ ءَايَٰتُ ٱللَّهِ نَتْلُوهَا عَلَيْكَ بِٱلْحَقِّ ۚ وَإِنَّكَ لَمِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴾، ئەوانە ئایەتەکانی خوان بە هەق بەسەر تۆیاندا دەخوێنینەوە (ئەی موحەممەد) وە تۆ لە ڕەوانەکراوانی.

## چەند مەسەلەیەکی گرنگ

**مەسەلەی یەکەم:** خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ خَرَجُوا۟ مِن دِيَٰرِهِمْ وَهُمْ أُلُوفٌ حَذَرَ ٱلْمَوْتِ فَقَالَ لَهُمُ ٱللَّهُ مُوتُوا۟ ثُمَّ أَحْيَٰهُمْ ... ﴾، بەڵام بۆمان باس ناکات! نەباسی ئەوە دەکات کە ئەو مردنە چی بووە، کە لێی ترساون، نە بۆمان باس دەکات ئەو قەومە کێ بووەو لەکوێ بوون؟ هیچیان باس

ناکات، بۆچی؟! چونکە قورئان کە لە چڵەپۆپەی ڕەوانبێژیی دایە، وەك جاری دیکەش ئاماژەمان پێداوە لایەنێکی زۆر گرنگی ڕەوانبێژیی بریتیە لە: کورتیی‌و پوختیی (الإیجاز) جا کاتێك قسە کورت‌و پوخت دەبێتەوە، کە زۆر نەچێتە نێوو وردەکارییەکانەوە، بۆ وێنە: خوا دەفەرموێ: داوود جالۆوتی کوشت، بەڵام ئەگەر بڵێ بە قۆچەقانییەك‌و قۆچەقانییەکەی چۆن هەڵسووڕاندو چۆن مۆڵەتی وەرگرت لە طالۆوت و...هتد، ئەوە دەچێتە نێو تەفصیلەوە، وە ئەگەر وابا ئێستا دەبووایە قورئان چەندان هێندەی ئێستا بووایە، ئەگەر بۆ هەموو بەسەرهاتێك وردەکارییەکانی باس بکردایە، چەند کەس بوون‌و ؟ چۆن بوون‌و ؟ بەرگیان چۆن بووەو ؟ فلانە ڕۆژ چییان کردو ؟ چۆن قسەیان دەکرد لەگەڵ یەکدیدا ؟ خوا ئەو وردەکارییە هەمووی دەپێچێتەوەو بە دوو سێ ڕستە بەسەرهاتەکە کورت دەکاتەوە، چونکە گرنگ لەو بەسەرهاتانە عیبرەت وەرگرتنە، وەك دوایی باسی دەکەین، ئەوە کە داوود لەو نێوەدا یەکسەر یەکجار ناوی دێ‌و جالۆوت دەکوژێ، ئەوە عیبرەتی تێدایە، وە بەسەرهاتی یەکەمیش خوای زانا دەیەوێ پێمان بفەرموێ: خەڵکینە ! لە ترسی مردنێ خۆتان مەمرێنن، لە ترسی کوشتنێ خۆ بەکوشتن مەدەن، من بینیومە لەترسی مردنێ کابرا ڕای کردوە، فیشەکی بە پشتی ملی کەوتوە، کەواتە: خوا دەیەوێ ئەوەمان لێ حاڵی بکات کە: لە مردنێ مەترسێن، وە لە ترسی مردنێ خۆ تووشی مردن مەکەن، لە ترسی کوشتنێ خۆ بە کوشتن مەدەن‌و، بەرهەڵستیی بکەن‌و خۆڕاگربن، بەوە سەلامەت دەبن.

**مەسەلەی دووەم:** کە دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَذُو فَضۡلٍ عَلَى ٱلنَّاسِ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَشۡكُرُونَ ﴾، واتە: بێگومان خوا خاوەنی چاکەیە بەسەر خەڵکییەوە، هەرچەندە زۆربەی خەڵکی سوپاسگوزارنین، تەماشا بکەن! خوا ﷻ چەند لێبووردەیە، چەند هێدییە، لەگەڵ ئەوەشدا کە دەزانێ زۆربەی خەڵکی سوپاسگوزارنین، وەفادارنین بە ئەمەك نین بەرانبەر بە خوا، کەچی بەخششی خۆیشی بە هەمووان هەردەدا، بەڵێ خوای زاناو شارەزا دەفەرموێ:

﴿ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَشْكُرُونَ ﴾، واتە: کەمێك لە بەندەکانم سوپاسگوزارن، شوکرانە بژێرن، بەڵام زۆربەیان سپڵەو ناسوپاسن، کەچی خوای پەروەردگار بەخششەکەی دەدا بە هەمووان، مەبەست ئەوەیە کە دەبێ هەر چاکە بکەی لەگەڵ خەڵکدا با زۆربەشیان، یان هەندێکیشیان سپڵە دەرچن‌و پێ نەزانن‌و بێ نمەك بن، لەبەرئەوەی کە هەندێکیان یاخود زۆربەیان بێ نمەك دەبن، ناکرێ تۆ چاکە نەکەی، چاکەی خۆت هەربکە، چونکە ئێمە دەبێ سیفەتەکانی خوای پەروەردگار ئەوەی بۆ ئێمە دەگونجێ لە خۆماندا بێنینەدی، خوای بەرزو مەزن کە دەفەرموێ: خوا بەرەحمەو زانایەو کاربەجێیەو خاوەنی عیزەتە، واتە: ئێوەش بە ڕەحم بن‌و، خاوەنی عیلم بن‌و، خاوەنی حیکمەت بن‌و، خاوەنی عیززەت بن.

**مەسەلەی سێیەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ وَقَٰتِلُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱعْلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴾، کەواتە: جەنگ کردن لە ئیسلامدا تەنها لەڕێی خوادایەو، لەپێناو هیچی دیکەدا نیەو، نابێ ئینسان بۆ هیچ ئامانجێك بجەنگێ، خەڵك بکوژێ، تەنهاو تەنها دەبێ بۆ ئەوە کە خوا لێی ڕازی بێ جەنگ‌و جیهاد بکات، وە تەنیا لە حاڵێکدا دەبێ ئامادەبێ خۆی بە کوشت بداو خەڵك بکوژێ، کە شەریعەت فەرمانی پێ کردوە، جا ئەو کاتە بۆی بە عیبادەت لەقەڵەم دەدرێ، بەڵام ئەگەر لەپێناوی هەرشتێکی دیکەدا بێ، بۆ مەدح‌و سەنا بێ، بۆ سەروەت‌و سامان بێ، لەپێناو هەرشتێکی دیکەدا بێ، مانای وایە ئینسان خۆی لەدەست دەدا، خۆی لەقیس دەچێ، وە ئەو کەسانەش کە دەیانکوژێ لەسەریان لێپرسینەوەی لەگەڵدا دەکرێ، چونکە لەپێناو ئامانجێکی ناڕەوادا کوژراوەو خەڵکی کوشتوە، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرموویەتی: {(مَنْ قاتَلَ لِتَكون كَلِمة الله هيَ العُليا فهو في سبيل الله)، البخاري: (١٢٣)، ومسلم: (١٩٠٤/ ١٥٠)}، واتە: هەر کەسێك بۆ ئەوە بجەنگێ کە وشەی خوا بەرزتر بێ، تەنیا ئەوە لە پێناوی خوادایە.

**مەسەلەی چوارەم:** خوا فەرموویەتی: ﴿ مَّن ذَا ٱلَّذِي يُقۡرِضُ ٱللَّهَ قَرۡضًا حَسَنًا ﴾، تەماشا بكەن ! خوا ﷻ لەگەڵ ئەوەشدا كە خۆی خاوەنی هەموو شتێكە، كەچی دەفەرموێ: ئەوەی كە بە خەڵكی دەدەن لەپێناوی مندا، ئەوە بەمنتان داوەو قەرزتان لەگەڵ من كردوە، تۆش‌و ئەوەش كە هەتە هی خوایە، كەچی خوا دەفەرموێ: لەوەی كە پێمداوی لە پێناوی مندا ببەخشە، ئەوكاتە قەرزت لەگەڵ مندا كردوە، ئەوە بۆچی ؟ بۆئەوەی خەڵك هان بدرێ لەسەر چاكەكردن، لەسەر ماڵ بەخشین كە تۆ ئەو ماڵە دەبەخشی هەر چاوت لە هەژارو نەدارەكە نەبێ كە پێی دەدەی، بەڵكو بزانە كە داوتە بە خوا ﷻ، وەك لە (صحيح مسلم) [1] لە فەرمایشتتێكی قودسیدا هاتوە، كە خوای بێهاوتا لە ڕۆژی دواییدا بە یەكێك لە بەندەكانی دەفەرموێ: ئەی بەندەكەم نەخۆشبووم سەردانت نەكردم ! دەڵێ: خوایە جا تۆ كە پەروەردگاری هەموو جیهانیانی، چۆن نەخۆش دەكەوی ؟! دەفەرموێ: ئەدی نازانی فلان بەندەیەم نەخۆش بوو سەردانت نەكرد، ئەگەر سەردانت بكردبایە منت لەوێ دەبینی ! {واتە: ڕەزامەندیی‌و پاداشتی منت لەوێ دەبینی}، هەروەها خوا ﷻ باسی خواردن پێدان‌و ئاو پێدان دەكات‌و دەفەرموێ: ئەی بەندەكەم برسی بووم نانت نەدامێ، تینوو بووم ئاوت نەدامێ ! دەڵێ: جا خوایە تۆ برسی‌و تینووت نابێ؟! دەفەرموێ: ئەدی نازانی فلان بەندەیەم كە برسی بوو، ئەگەر خواردنت پێدابایە، یان ئەوەی كە تینوو بوو، ئاوت پێ دابایە، ئەوە پاداشتەكەت لای من دەبینیەوە !

**مەسەلەی پێنجەم:** كە دەفەرموێ: ﴿ فَيُضَٰعِفَهُۥ لَهُۥٓ أَضۡعَافٗا كَثِيرَةٗ ﴾، واتە: بۆی دەكاتە چەند قات‌و بەرانبەری زۆر، ئەوە لەدوارۆژ دایە، بەڵام زۆرجار لە دنیاشدا هەروایە، تۆ تەماشا دەكەی ئەوانەی كە ماڵ دەبەخشن‌و چاكە لەگەڵ خەڵك دەكەن، مەدح‌و سەنایان بڵاودەبێتەوەو، خەڵك متمانەیان پێ دەكات‌و كەسایەتییان خۆشەویست دەبێ‌و، زۆرجار لەڕووی ماددیی‌و مەعنەوییەوە زۆر

---

١) بڕوانە: (صحيح مسلم) : (٢٥٦٩)، باب فضل عيادة المريض.

ئیستیفادە دەکەن، لە ئەنجامی ماڵو سامان بەخشیندا، وە بە پێچەوانەوە ئەو کەسەی کە چرووكو ڕژدە، پێش قیامەت، هەر لە دنیادا زەرەر دەکات خەڵك، زەمی دەکاتو لەڕووی ماددییو لەڕووی مەعنەوییەوە زەرەر دەکات، خەڵك خۆی لێ دوور دەگرێ، هەڵبەتە بۆیەش خوا (جَلَّ شأنُهُ) لەدوای ئەوەی کە فەرمان دەکات بە جەنگ لەپێناوی خوادا، ئنجا باسی ماڵ بەخشینو قەرز بە خوادان دەکات، چونکە جەنگ لەرێی خوادا ناکرێ، مەگەر ماڵو سامانێك هەبێتو ببەخشرێ، ئەوجار بەو ماڵو سامانە پێداویستییەکانی جەنگو جیهاد ساز بکرێن، بۆیە هەمیشە لە قورئاندا خوای پەروەردگار جیهادی ماڵو سامانی، پێش جیهادی ڕووحو گیان خستوە.

**مەسەلەی شەشەم:** کە دەفەرموێ: ﴿وَٱللَّهُ يَقۡبِضُ وَيَبۡصُۜطُ﴾، خوا ڕۆزیی تەنگ دەکاو فراوان دەکات، یاخود کەم دەکاتو زۆر دەکات، ئەمە ئەوەی لێوەردەگیرێ کە هەرچەندە توانای بەندەکان کاریگەریی هەیە لەسەر فراوانبوونی ڕزقو کەمبوونی، لەسەر تەنگبوونەوەیو زۆربوونی، بەڵام سەرەنجام هەمووی دەبێ بچێتەوە دەستی خوای پەروەردگار، بۆیە جاری وا هەیە کەسێك زۆر خۆی ماندوو دەکاتو زۆر توانا سەرف دەکات، بەڵام تەماشا دەکەی ئاستی ژیانو گوزەرانی هەر نزمە، یەکێکی دیکەش هەیە کەمتر خۆی ماندوو دەکات، کەچی ڕزقی بۆ فراوان دەبێ، دەبێ ئێمە ئەو حەقیقەتە بزانین کە سەرەنجام ئیرادەی خوایە ﷻ کە تەحەککوم دەکات لە مەسەلەی ڕزقدا، بەڵام دیارە خوای کاربەجێ ڕزق بۆ کەس نابارێنێو دەبێ ئینسان دەست بجووڵێنێ.

ئنجا بێگومان ڕەهای خوای کارەجێش بەگوێرە کارناکاتو ئەویش هەر لە میانەی یاساکان (سنن)دا کاری خۆی دەکات.

**مەسەلەی حەوتەم:** کە دەفەرموێ: ﴿أَلَمۡ تَرَ إِلَى ٱلۡمَلَإِ مِنۢ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ مِنۢ بَعۡدِ مُوسَىٰٓ إِذۡ قَالُواْ لِنَبِيّٖ لَّهُمُ ٱبۡعَثۡ لَنَا مَلِكٗا نُّقَٰتِلۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾، کە پێشتر تەفسیرمان کرد، ئەوەی لێوەردەگیرێ کە مشوورخۆرو قسە بەدەستانی هەر

کۆمەڵگایەك، لەپێش زۆربەی خەڵکەکەدا زیاتر، وە زووتر هەست بە شت دەکەن، وە ئەوەشی لێوەردەگیرێ کە هیچ گەلو کۆمەڵگایەك بەبێ مشوورخۆرو بەبێ سەرپەرشتیارانێك، کە مشووری بخۆن، بەڕێوە ناچێ، وەك شاعیر گوتوویەتی:

**لا يَصلُح الناسُ فَوضى لاسُراة لهم**

**ولايصلحون إذا شرارُهم سادوا**[1]

**مەسەلەی هەشتەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ ٱبۡعَثۡ لَنَا مَلِكٗا نُّقَٰتِلۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ﴾، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ، کە بەبێ سەرکردەو فەرماندە جەنگ ناکرێ، واتە: ناکرێ هەرکەسەو لەڕێی خۆیەوە بڕواو بڵێ: ئەوە دەچین جیهاد دەکەین! جەنگو جیهادکردن دەبێ بە بەرنامەبێو دەبێ ڕێكوپێکیی تێدا هەبێو سەروبەری هەبێ، کە ئەوەش بە تەئکید بەبێ فەرماندەو سەرکردە بەڕێوەناچێ، (عمر بن الخطاب)یش خوا لێی ڕازی بێ لەوبارەوە قسەیەکی جوانی هەیە دەڵێ: (...إنّه لا إسلامَ بلا جماعة ولا جماعة الاّ بإمارة، ولا إمارة الاّ بطاعة)، رواه الدارمي: (١/٧٩)، واتە: بێگومان ئیسلام بەبێ کۆمەڵ نابێ، کۆمەڵیش بەبێ بەرپرسیارێتیو فەرماندەیتیی نابێ، فەرماندەییو بەرپرسێتییش بەبێ فەرمانبەریی نابێ.

**مەسەلەی نۆیەم:** کە پێغەمبەرەکەیان ﷺ دەفەرموێ: ﴿ هَلۡ عَسَيۡتُمۡ إِن كُتِبَ عَلَيۡكُمُ ٱلۡقِتَالُ أَلَّا تُقَٰتِلُواْ ﴾، ئایا نزیك نیە، ئەگەر جەنگتان لەسەر پێویست کرا، جەنگ نەکەن! چی لێوەردەگیرێ؟! ئەوەی لێوەردەگیرێ کە ئەو پێغەمبەرە ﷺ ئەو خەڵکەی باش ناسیوە، وە هەرکەسێك سەرپەرشتی خەڵکێك بکات دەبێ هەوڵبدات بیانناسێو شارەزایان بێو پێیان ئاشنابێ، بۆ ئەوەی دوایی تووشی شتی چاوەڕواننکراو (مُفَاجَئَات) نەبێ، ئەو پێغەمبەرەش

---

[1] واتە: خەڵك چاك نابن ئەگەر پاشا گەردنیی بێو سەرپەرشتیاریان نەبن، هەروەها هەتا خراپەکارەکانیشیان بڕیار بەدەست بن چاك نابن.

دیارە ناسیونی و زانیویەتی ئەو خەڵکە لەوەچەی ئیسرائیل لە مێژە چەوسێنراونەوەو زوڵمیان لێکراوەو، زانیویەتی زۆر عیللەتو نەخۆشییان تێدا پەیدابوون، لە ئەنجامی ئەو چەوسێنرانەوەیە داو، ئەوە نین کە هێندە خۆیان ئازا کردوەو دەڵێن: ئێمە ئامادەین بۆ جەنگو جیهاد، بەڵێ بە قسە ئازان، بەڵام کە دێتە سەر کردەوە، وا دەرناچن وە سەرەنجام بۆچوونەکەشی ڕاست دەرچوو.

**مەسەلەی دەیەم:** کە ئەوان دەڵێن: ﴿قَالُواْ وَمَا لَنَآ أَلَّا نُقَٰتِلَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَقَدۡ أُخۡرِجۡنَا مِن دِيَٰرِنَا وَأَبۡنَآئِنَا﴾، بۆچی لەڕێی خوادا جیهادو جەنگ ناکەین لە حاڵێکدا کە لەماڵوحاڵمانو لەنێو منداڵو کوڕەکانمان وەدەرنراوین ؟! ئەمە چی لێوەردەگیرێ؟ ئەوەی لێوەردەگیرێ کە بەرگرییکردن لە ئەرزو ئابڕووو، بەرگرییکردن لە نیشتمانو لە ئەهلو خەڵکیش، هەر جەنگو جیهادە لە پێناوی خوادا، چونکە دەفەرموێ: بۆچی لەڕێی خوادا جەنگ ناکەین ! لە حاڵێکدا کە لە نیشتمانی خۆمان وە لەنێو خزمو کەسی خۆمان وەدەرنراوینو لێك دابڕاوین؟!

**مەسەلەی یازدەیەم:** کە دەفەرموێ: ﴿فَلَمَّا كُتِبَ عَلَيۡهِمُ ٱلۡقِتَالُ تَوَلَّوۡاْ إِلَّا قَلِيلٗا مِّنۡهُمۡ﴾، ئەوەش حەقیقەتێکی کۆمەڵناسیی بۆ ئێمە دەردەخات، کە زۆربەی خەڵکی ئەوانەی کە زۆر بۆ قسان گەرمن لە کردەوان ساردن، هەیە کە بە قسە زۆر ئازایەتی دەنوێنێ، بەڵام دوایی بە کردەوە وا دەرناچێ، بۆیە کوردەواریی خۆشمان دەڵێن: (ئاوی خوڕ تەنکە) ئاو ئەگەر خوڕە خوڕی بێ تەنکە، ئاوی مەند، ئاوی قووڵ دەنگی زۆر نایەت، من بۆخۆشم ئەو تاقیکردنەوەم هەیە، هەیە دەڵێ: تۆ هەر لێمگەڕێ شێرت بە گوێی بۆ دەگرمو وادەکەم تا وابچێ، کەچی دوایی وا دەرناچێ ! بۆیەش پێشینان لەبارەی ئەو جۆرە کەسانەوە گوتوویانە: (زۆر دەخوڕێو کەم دەبڕێ !)، هەیە هەڕوگیفان ناکات، بەڵام لەکاتی تەنگانەدا هەر جەوهەرە، برایەکمان هەبوو زۆر پیاوێکی ئازا بوو، دەیگوت مامۆستا من وەك ئەو برایانە ناڵێم وادەکەمو وادەچم چونکە بەڕاستی تا ئێستا شەرم نەکردوەو دەترسم وا دەرنەچم، بەڵام

إن شاء الله باشیش دەردەچم، دوایش قارەمانێك بوو، شەهیدیش بوو خوای پەروەردگار بە شەهیدی وەرگرتبێ.

**مەسەلەی دوازدەیەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ وَقَالَ لَهُمْ نَبِيُّهُمْ إِنَّ اللَّهَ قَدْ بَعَثَ لَكُمْ طَالُوتَ مَلِكًا ﴾، ئەوەی لێوەردەگیرێ کە دیاریکردنی سەرپەرشتیارو مشوورخۆرو فەرماندە، دوو ڕێی هەیە، یان دەبێ خوا دیاریی بکات، یان خەڵك، طاڵووت خوای کاربەجێ دیاری کردبوو، چونکە دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ اللَّهَ قَدْ بَعَثَ لَكُمْ طَالُوتَ مَلِكًا ﴾، ئەگەر خوای تاك و پاك دیاری نەکردبا، دەبوو بگوترێ: خەڵکینە ! دەفەرموون خۆتان هەڵبژێرن، کەواتە: ئێمە ئەو دوو ڕێیەمان هەیە، پێغەمبەران (عليهم الصلاة السلام) خوای بێوێنە دیاری کردوون و، غەیری پێغەمبەران لە حوکمڕانانی مسوڵمانان، دەبێ خەڵك دیارییان بکات، ڕێی سێیەممان بریتیە لەوەی کە بۆ خۆیان خۆبسەپێنن، یاخود حوکمی میراتیی بێ، واتە: دیکتاتۆریی یان میراتیی، کە هەرکامیان هیچ فڕی بەسەر ئیسلامەوە نیە، هەرچەندە بەداخەوە هەر لە دوای چوار خەلیفە ڕاشیدەکانەوە هەتا ئەمڕۆ، ئەگەر بەدەگمەن، دەنا حوکمڕان و بەرپرسانی مسوڵمانان بە یەکێك لەو دوو ڕێیە نەفامیی و ناشەرعییەکان: خۆسەپاندن، یان میراتیی چوونەتە سەرکورسی حوکم، بەڵام لەخوا بەزیادبێ کە ئەوە بەم دواییانە مسوڵمانان... بەتایبەت لە وڵاتانی عەرەبیدا خەریکی هۆشیاربوونەوەو شۆڕش و ڕاپەڕین و کۆتایی پێهێنانی ئەو حوکم و ڕژێمە خۆسەپێن و میراتییانەن ! .

**مەسەلەی سێزدەیەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ أَنَّىٰ يَكُونُ لَهُ الْمُلْكُ عَلَيْنَا وَنَحْنُ أَحَقُّ بِالْمُلْكِ مِنْهُ وَلَمْ يُؤْتَ سَعَةً مِّنَ الْمَالِ ﴾، دوای ئەوەی طاڵووت بە سەرکردە دیاری دەکرێ، دەڵێن: جا چۆن دەبێ ئەو مشوورخۆرو سەرپەرشتیارو بەرپرسی ئێمەبێ، خۆ ئێمە شایستەترین لەو، وە ماڵ و سامانێکی زۆریشی نیە، وەك لە بەسەرهاتەکەشیدا باسمکرد، بۆیە گوتوویانە: ئێمە شایستەترین، وا پێدەچێ ئەوانە بنەماڵە بووبن، وەك چۆن لە بنەماڵەی عەشیرەتاندا هەیە هەر بە

میراتیی بنەماڵەیی سەرپەرشتیاریی‌و برا گەورایەتییان بۆ بەجێ دەمێنێ، دیارە ئەوانەش لەوجۆرە بوون‌و واشپێدەچێ طاڵووت کوڕە شوانێك، کوڕە نەدارێك بووبێ، جا ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کە بەداخەوە - ئێستاش زۆربەی خەڵکی هەروان - زۆربەی خەڵکی بۆ مەسەلەی حوکم‌و سیاسەت لەسەر بنەمای ڕەچەڵەك تەماشای دەکەن‌و، تەماشای سەروەت‌و سامان دەکەن‌و تەماشای خودی ئەو ئینسانە ناکەن کە چی لەباراندا هەیە، تەماشا دەکەن: سەروەت‌و سامانی چەندەو؟ باب‌و باپیریشی کێن؟ لەحاڵێکدا ئەوە کە سەروەت‌و سامانی چەندەو، باب‌و باپیری کێن؟ وەك پێنجوێنی دەڵێن: فلسێك ناژێ[1]، بۆچی؟ چونکە خەڵك کە لێی قەوما پێویستی بە سەرکردەیەك هەیە، ئەگەرنا فلان کەس کوڕی فلان کەسە، فلان کەس بەگە، فلان کەس ئاغایە، فلان کەس شێخە، فلان کەس مامۆستایە، فایدەی چییە، بابی چاك بووە، ئەگەر بۆخۆی هیچی لەباراندا نەبێ، پەکمان دەخات، یان فایدەی چییە سەروەت‌و سامانی زۆربێ، مادام شایستە نەبێ، ئیشەکەی ئێمە پەك دەخات، بۆیە خوا ﷻ ئەو ڕاستییەی بۆ ئێمە ڕوون کردۆتەوە.

**مەسەلەی چوارەیەم:** کە دەفەرموێ: ﴿قَالَ إِنَّ ٱللَّهَ ٱصۡطَفَىٰهُ عَلَيۡكُمۡ وَزَادَهُۥ بَسۡطَةً فِي ٱلۡعِلۡمِ وَٱلۡجِسۡمِۖ﴾، پێغەمبەرەکەیان چۆن وەڵام دەداتەوە؟ فەرمووی: خوا بەسەر ئێوەیدا هەڵبژاردوە، وە لەڕووی زانستییەوەو لەڕووی جەستەییشەوە زیادەی پێداوە، واتە: لەڕووی فیکریی‌و زانستییەوە زێدەیی پێداوەو، لەڕووی کردەیی‌و جەستەییشەوە دیسان توانایەکی زێدەی پێداوە، واتە: ئەو دەتوانێ کە بەو ئەرکەی خۆی هەڵسێ، بۆیەش هەڵیبژاردوە، ئیشی خوا گۆترە نیەو لەخۆڕا خەڵکی هەڵنابژێرێ، بەڵکو ئیشی خوا هەمووی بەجێیەو یەکێ لە سیفەتە بەرزەکانی خوای بەرزو مەزن ئەوەیە کە کاربەجێیە.

---

[1] فلسێك ناهێنێ.

**مەسەلەی پازدەیەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ وَٱللَّهُ يُؤْتِي مُلْكَهُۥ مَن يَشَآءُ ﴾، ئەمیش ئەوی لێوەردەگیرێ، کە خوا ﷻ ئیرادەکەی ڕەهاو بێسنووورەو، بە هیچ شتێکەوە نەبەستراوەتەوەو، خوای پەروەردگار بەپێی ئیرادەی ئازادانەی خۆی تەصەڕڕوف دەکات، بەڵام بێگومان ئیرادەی ئازادی خوا (تبارك وتعالى) هەرچەندە ڕەهاو بێسنوورەو، بە هیچ شتێکەوە نەبەستراوەتەوە، تەنیا بەپێی زانیاریی و حیکمەتی بێسنووریشی دەجوولێتەوە، وەك (هود) پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ﴿ ...إِنَّ رَبِّي عَلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٥٦﴾ ﴾ هود، واتە: بێگومان پەروەردگارم لەسەر ڕاستە ڕێیە

**مەسەلەی شازدەیەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ وَقَالَ لَهُمْ نَبِيُّهُمْ إِنَّ ءَايَةَ مُلْكِهِۦٓ أَن يَأْتِيَكُمُ ٱلتَّابُوتُ فِيهِ سَكِينَةٌ مِّن رَّبِّكُمْ وَبَقِيَّةٌ مِّمَّا تَرَكَ ءَالُ مُوسَىٰ وَءَالُ هَٰرُونَ تَحْمِلُهُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ ﴾، وەك پێشتریش ئاماژەم پێدا، میللەتانی پێش ئیسلام لە قۆناغێکی ساواییدا بوون و هەمیشە حەزیان کردوە موعجیزەو بەڵگەی بەرچاوو بەرهەستیان هەبێ، بۆیە ئەگەر تەماشای موعجیزەکانی پێغەمبەرانی پێش موحەممەد ﷺ بکەین دەبینین پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) هەموویان، موعجیزەکانیان بەرهەست بوون، بۆ وێنە: حوشترەکەی صالح، گۆچانەکەی مووسا، ئاسن نەرمکران بۆ داوود، باڵندەو جند ڕامکران بۆ سولەیمان، مردوو زیندووکردنەوەی عیسا، بەڵام بۆچی خوای زاناو شارەزا بۆ پێغەمبەری کۆتایی ﷺ موعجیزەیەکی عیلمیی فیکریی ناردوە، کە قورئانە؟ لەبەر ئەوەی خوا زانیویەتی کە لەدوای هاتنی پێغەمبەری کۆتایی، مرۆڤایەتی دەگاتە قۆناغی ڕوشدو کامڵبوون و موعجیزەیەکی عیلمیی و فیکریی پێویستە، وە ئەگەر گریمان موعجیزەکەی بەرهەستیش بووایە، بە کۆچی دوایی پێغەمبەر ﷺ موعجیزەکە کۆتایی دەهات، وەك موعجیزەی پێغەمبەرانی دیکە، کە لەگەڵ وەفاتی خۆیان موعجیزەکانیشیان کۆتایی هاتوە، بەڵام ئێستا هەرچەندە پێغەمبەری کۆتایی ﷺ وەفاتی کردوە، بەڵام موعجیزەکەی، ئەو موعجیزەیەی کە تەحەددای ئینس و جینی پێ کردوە، لەبەردەستی ئێمەدا هەر هەیە.

**مەسەلەی حەقدەیەم:** کە دەفەرموێ: ﴿فَلَمَّا فَصَلَ طَالُوتُ بِٱلۡجُنُودِ قَالَ إِنَّ ٱللَّهَ مُبۡتَلِيكُم بِنَهَرٖ﴾، جا کاتێك طاڵووت سوپاکەی جیاکردەوە لە ئاوەدانیو ڕووی پێ لە دوژمن کردو بەرەو ئەو شوێنە ڕۆیشت کە دوژمنی لێیە، گوتی: خوا بە ڕووبارێك تاقییتان دەکاتەوە، ئەمە ئەوەی لێوەردەگیرێ کە سەرکردە دەبێ خەڵکی خۆی تاقی بکاتەوە، بەرلەوەی ڕووبەڕوو بێتەوە لەگەڵ دوژمنداو، پێش ئەوەی بکەونە حاڵەتی ناخۆشەوە، دەبێ بە شێنەیی تاقییان بکاتەوە، تاکو مەعدەنی ئەو خەڵکەی بۆ دەربکەوێو بزانێ داخۆ چۆنن ؟ تاکو ئەوانەی کە بێهێزو لاوازو لەبارانددا نەبوون، هەر لە سەرەتاوە بگەڕێنەوە نەوەك بێنو دوایی لەڕێی وانەوە کەلێنێك لە سوپاکەدا پەیدابێ، چونکە جاری واهەیە ئینسانێکی ترسنۆك، یان کەسێك شتێکی لە توانادا نیە، زەربە دەدا لە خەڵکێکی زۆری ئازاو بە توانا، بۆیە ئەگەر ئەوانە هەر لە سەرەتاوە دوور بخرێنەوە، بە تەئکید ئەوە سەلامەتی زیاتری تێدایە.

**مەسەلەی هەژدەیەم:** کە دەفەرموێ: ﴿فَشَرِبُواْ مِنۡهُ إِلَّا قَلِيلٗا مِّنۡهُمۡ﴾، دوای ئەوەی طاڵووت پێی گوتن هەر کەسێك لە لوێچێك زیاتر ئاو لەو ڕووبارە بخواتەوە، ئەوە لەمن نیە، واتە: دەبێ بگەڕێتەوە خوای بینەرو بیسەر دەفەرموێ: ﴿فَشَرِبُواْ مِنۡهُ إِلَّا قَلِيلٗا مِّنۡهُمۡ﴾، جگە لە کەمێکیان هەموویان لێیان خواردەوە، جا ئێستا با سەرنج بدەین ! لەشکرەکەی طاڵووت چەند جارێك لە بێژینگ دراون:

١/ جارێ هەر لە سەرەتاوە جارێك لە بێژینگ دران، وەك دەفەرموێ: ﴿فَلَمَّا كُتِبَ عَلَيۡهِمُ ٱلۡقِتَالُ تَوَلَّوۡاْ إِلَّا قَلِيلٗا مِّنۡهُمۡ﴾، هەر کە جەنگیان لەسەر پێویست کرا جگە لە کەمێکیان پشتیان هەڵکرد.

٢/ هەروەها دوای ئەوەی کە طاڵووتیان کرا بە سەرکردە، ڕەخنەیان لێگرتو واپێدەچێ زۆربەیان ڕەخنەیان هەبووبێو ئەوانیش کشاونەوە.

٣/ هەروەها دوای ئەوەی کە طاڵووت بە ئاو نەخواردنەوە تاقیکردنەوە، جگە لە مستێك، دیسان کەمێك نەبێ هەموو لێیان خواردەوە !

کەواتە: ئەو کۆمەڵە کەمەی، کە طاڵووت: پێیان ڕووبەڕوو بۆتەوە لەگەڵ دوژمندا، سێ جاران لە بێژینگ دراون و پاڵفتە کراون، کەواتە: بەرپرس و سەرکردە، هەمیشە دەبێ ئەمە لەبەرچاو بگرێ، کە هەموو کەس توانای ئەوەی نیە لە تاقیکردنەوە دەربچێ، بۆیەش کاتێك خەڵکێك لە تاقیکردنەوە دەرناچێ، زۆر نەشڵەژێو خۆی تێك نادا، چونکە پێشتر لە پێش چاوی گرتوە.

**مەسەلەی نۆزدەیەم:** کە دەفەرموێ: ﴿فَلَمَّا جَاوَزَهُۥ هُوَ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَعَهُۥ قَالُواْ لَا طَاقَةَ لَنَا ٱلْيَوْمَ بِجَالُوتَ وَجُنُودِهِۦ﴾، واتە: پاش ئەوەی خۆی و ئەو بڕوادارانەی لەگەڵی دا بوون، لە ڕووبارەکە پەڕینەوە، گوتیان: ئێمە توانای جالووت و سەربازەکانیمان نیە، ئەوەی لێوەردەگیرێ کە کەوتنە حاڵەتی کردەیی، جیایە لە حاڵەتی ئاسایی و تیۆریی، ئینسان کە بە کردەوە شتێك دەکا، زۆر جیایە لەوەی کە بە قسە باسی دەکات، بۆیە کوردەواریی خۆمان دەڵێن: (بێڵی قوڕێ بەدەست خەڵکەوە سووکە) واتە: بۆخۆت دەستی بدەیە ئەوجار دەزانی چۆنە ! کاتێك تەماشای کەسێك دەکەی ئیشێکی وەك قوڕکاریی دەکات، دەڵێی: ئەوە بۆچی بێڵەکەی باش هەڵنادات؟ تۆ بۆخۆت بچۆ بێڵەکەی لێوەربگرە، بزانە داخۆ تۆ چۆنی دەکەی؟ بەڵێ بێگومان بە کردەوە ئیشکردن جیایە لەوەی هەروا بەچاو تەماشای بکەی و قسەی لەبارەوە بکەی.

**مەسەلەی بیستەم:** کە دەفەرموێ: ﴿قَالَ ٱلَّذِينَ يَظُنُّونَ أَنَّهُم مُّلَٰقُواْ ٱللَّهِ كَم مِّن فِئَةٍ قَلِيلَةٍ غَلَبَتْ فِئَةً كَثِيرَةًۢ بِإِذْنِ ٱللَّهِ﴾، وەك پێشتر باسکرا، سوپایەکەی طاڵووت دوای ئەوەی کە دوژمنیان بینی و سوپای جالووتیان بینی، گوتیان: ﴿قَالُواْ لَا طَاقَةَ لَنَا ٱلْيَوْمَ بِجَالُوتَ وَجُنُودِهِۦ﴾، کە واپێدەچێ ئەوانەش کە گوتوویانە: ئەمڕۆ بە جالووت و سوپاکەی ناوێرین، ئەوانیش کشابنەوە، هەرچەند باس نەکراوەو دەشگونجێ بە لە قەلەقەوەو بە

بێهێزیی هەر مابنەوە، بەڵام کێ چارەنووسی ئەو جەنگەی هەڵبڕی؟ بێگومان ئەو کۆمەڵە کەمەی کە چەند جار پاڵاوتە کرابوون: ﴿قَالَ ٱلَّذِينَ يَظُنُّونَ أَنَّهُم مُّلَٰقُواْ ٱللَّهِ﴾، ئەوانەی کە گومانیان وابوو شەهید دەبن، یاخود ئەوانەی کە دڵنیایی (یقین)یان هەبوو، کە دەگەنە دیداری خوا، کەواتە: کێ چارەنووسی جەنگ حەسم دەکات؟ هەڵبەتە ئەوانەی کە عەقیدەی پتەویان هەیەو یان بۆ شەهیدیی بێنە مەیدانێو پێیان وابێ شەهید دەبێ، یان یەقینیان هەبێ کە بە دیداری خوای پەروەردگار دەگەن.

**مەسەلەی بیست و یەکەم:** کە دەفەرموێ: ﴿وَٱللَّهُ مَعَ ٱلصَّٰبِرِينَ﴾، ئەوە یاساو سوننەتی خوایە، کە خوا لەگەڵ خۆڕاگراندایە، جا ئەو خۆڕاگرانە ئەگەر کافریش بن، خوای دادگەر بەپێی ئەو یاسایە هەر لەگەڵیاندایە، چونکە لە سوورەتی (الإسراء)دا دەفەرموێ: ﴿كُلًّا نُّمِدُّ هَٰٓؤُلَآءِ وَهَٰٓؤُلَآءِ مِنْ عَطَآءِ رَبِّكَ ﴿٢٠﴾﴾، واتە: ئێمە ئیمدادی هەر کامێکیان دەکەین ئەوانەش و ئەوانەش، لە بەخششی پەروەردگارت، باسی ئەهلی دنیاو ئەهلی دوارۆژ دەکات، دەفەرموێ: ئێمە هاوکاری هەردووک لایان دەکەین لە بەخششی پەروەردگارت، کەواتە: دەبێ بزانین کافریش ئەگەر سیفەتی باشی تێدا هەبن، ئەو سیفەتە باشانەی سەری دەخەن، وە بە پێچەوانەوە مسوڵمانیش ئەگەر سیفەتی بێهێزی تێدا هەبن، ئەو سیفەتانەی ژێری دەخەن، کەواتە: هەر کەس کە گوتی: مسوڵمانم، هەر لەبەر ئەوەی دەڵێ مسوڵمانم، سەرناکەوێ، وە کافریش هەر لەبەرئەوەی پێی دەگوترێ کافر، ژێرناکەوێ، بەڵکو مسوڵمان لەبەر سیفەتە باشەکانی سەردەکەوێو کافریش لەبەر سیفەتە خراپەکانی ژێردەکەوێ، بەڵام ئەگەر هاتو بە پێچەوانەوە سیفەتی خراپ لە مسوڵماندا پەیدابوون‌و، سیفەتی باش لە کافردا پەیدابوون، بەتەئکید ئەو کاتە تەرازووەکەو هاوکێشەکە دەگۆڕێ، وە قورئان‌و ئیسلامیش هەمیشە مسوڵمانان پەروەردە دەکەن، تاکو بیانکەنە خاوەنی سیفەتی باش، بۆ ئەوەی بەهۆی سیفەتە باشەکانەوە سەربکەون.

**مەسەلەی بیست و دووەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ وَلَمَّا بَرَزُواْ لِجَالُوتَ وَجُنُودِهِۦ قَالُواْ رَبَّنَآ أَفۡرِغۡ عَلَيۡنَا صَبۡرٗا وَثَبِّتۡ أَقۡدَامَنَا وَٱنصُرۡنَا عَلَى ٱلۡقَوۡمِ ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴾، واتە: دوای ئەوەی کە بۆ جالووت و سوپاکەی چوونە مەیدانێ، گوتیان: پەروەردگارمان ئارامییمان بڕژێنە سەرو پێیەکانمان بچەسپێنەو بەسەر گەلی کافراندا سەرمان بخە، کەی پاڕاونەوە ؟ بێگومان لە ماڵێ نەپاڕاونەوە، بەڵکو کاتێ کە چوونەتە ڕووبەڕووی دوژمن، کەواتە: دەبێ ئینسان لە گەرمەی ئیشدا دووعا بکات، نەك هەر لەجێوە بە هەڵخزاویی دووعا بکەی، وەرە لە گەرمەی ڕووبەڕووبوونەوەداو لە گەرمەی کاردا، هەموو هۆیەکان سازبکەو بچۆ مەیدانێ، ئەوجار بپاڕێوە، بۆچی؟ چونکە ئەگەر تۆ هەموو هۆکارەکانت ساز کردن، مانای وایە تۆ ئەوەی لەتوانای خۆتدایە کردووتە، ئەوجار ماوەتەوە خوا ﷻ، دیارە ئەویش توانای خۆی بۆ تۆ دەخاتە کار، مادام تۆ کەمتەرخەمییت نەکردبێ !

پێشتر لەکاتی تەفسیرکردنی ئایەتی: ﴿ وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِي عَنِّي فَإِنِّي قَرِيبٌۖ أُجِيبُ دَعۡوَةَ ٱلدَّاعِ إِذَا دَعَانِۖ ... ﴿١٨٦﴾ ﴾ البقرة، دا باسمان کردوە، کە چۆن چۆنی دەبێ دووعا بکرێ و پێغەمبەری خوا کەی و چۆن لە خوا پاڕاوەتەوە !

**مەسەلەی بیست و سێیەم:** ئەوانەی لەگەڵ جالووت و سوپایەکەیدا ڕووبەڕووبوونەوە، داوای سێ شتیان لە خوای پەروەردگار کردوەو گوتوویانە: ﴿ أَفۡرِغۡ عَلَيۡنَا صَبۡرٗا وَثَبِّتۡ أَقۡدَامَنَا وَٱنصُرۡنَا عَلَى ٱلۡقَوۡمِ ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴾، کەواتە: ئەگەر بیکەی بە هاوکێشەیەکی ماتماتیکیی، ئاوای لێ دێ:

خۆڕاگریی بەسەردا هەڵڕژان + پێ چەسپێنران = سەرکەوتن

کەواتە: هەر کەسێك ئەهلی صەبرو خۆڕاگریی بێ، پێی دەچەسپێ و ڕاناکات و هەڵنایەت، وە کەسی واش سەردەکەوێ، وە ئەمە لە هەموو ئیشێکدا هەروایە، نەك هەر لە جەنگدا.

**مەسەلەی بیستو چوارەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ فَهَزَمُوهُم بِإِذْنِ ٱللَّهِ ﴾، چی لێوەردەگیرێ ؟ خوای تاكو پاك دەفەرموێ: دوژمنیان شكاند بە مۆڵەتی خوا، یان بە ویستی خوا، یان بە فەرمانی خوا، ئەمەش ئەوەی لێوەردەگیرێ كە هەرچەندە هۆكارەكان هەبن، بەڵام دیسان ویستی خوای باڵادەست بەسەر هەموو شتێكدا هەیمەنەی هەیە، بۆیە نابێ مرۆڤ بەهۆی هۆكارەكانەوە لەخۆبایی بێو بڵێ: لەشكرێكی زۆرمان هەیەو، چەكی باشمان پێیەو، كەلوپەلی باشمان هەیە، جا بۆ سەرناكەوین ؟ نەخێر، ئەوەی كە شتەكان یەكلایی دەكاتەوە، سەرەنجام هەر ئیرادەی خوای پەروەردگارەو، هۆكارەكان ئەگەر خوا نەیەوێ بەرهەمیان نابێ، ئەگەر خوا ویستی ئاگر ناسووتێنێ، وە ئەگەر خوا ویستی ئاو خەڵكی ناخنكێنێ، بەڵام ئەگەر خوا ویستی مێشووله ئینسان لەبەین دەبات، بۆ وێنە: شتێكی ئاشكرایە، كە هەركام لە: هەوا، ئاو، گڵ، دەنگ لە پێداویستییە زۆر گرنگەكانی ژیانن، كە مرۆڤ بەبێ وان ژیانو گوزەرانی ناكرێ، كەچی دەبینین خوای باڵادەست هەركام لەو چوارەی كردوون بە هۆكاری لەبەینبردنی گەلێك، یان زیاتر لە گەلانی یاخیو سەركەش، وەك فەرموویەتی: ﴿ فَكُلًّا أَخَذْنَا بِذَنۢبِهِۦ فَمِنْهُم مَّنْ أَرْسَلْنَا عَلَيْهِ حَاصِبًا وَمِنْهُم مَّنْ أَخَذَتْهُ ٱلصَّيْحَةُ وَمِنْهُم مَّنْ خَسَفْنَا بِهِ ٱلْأَرْضَ وَمِنْهُم مَّنْ أَغْرَقْنَا ...﴿٤٠﴾ ﴾ العنكبوت، واتە: هەركامێكیانمان بە تاوانەكەی گرتو سزادا: هەیانبوو (با)مان ناردنە سەر، كە وردە بەردی هەڵگرتبوو، وە هەیانبوو چریكە گرتی، وە هەیانبوو بە زەویدا بردمانە خوار، وە هەیانبوو لەئاودا خنكاندمان...

دیارە مەبەستمان ئەوە نیە كە گوێ بە هۆكارەكان نەدرێ، چونكە عادەتی خوا وایە كە لەمیانەی هۆكارەكاندا ئیشوكارەكان ئەنجام دەدات، بۆ وێنە: بەبێ دایكو باب، منداڵ پەیدانابێو، بەبێ زەویو تۆو وەشاندن دەغڵ ناڕوێ، بەڵام مەبەستمان ئەوەیە كە پشتمان تەنیا بەخوا قایم بێو دڵنیابین كە بەبێ ویستی خوای باڵادەستو كاربەجێ هیچ كارێك سەروبەرناگرێ، بۆیە وێڕای دەستگرتن بە هۆكارەكانەوە، پێویستە دڵیشمان هەردەم بە خواوە پەیوەست بێ !

**مەسەلەی بیست‌و پێنجەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ وَقَتَلَ دَاوُۥدُ جَالُوتَ ﴾، واتە: داوود جالووتی کوشت، کە پێشێ باسی داوود هەر لەئارادا نەبووە، جا ئەمە ئەوەی لێوەردەگیرێ، کە قارەمانان‌و پیاوانی سەرکەوتوو لە تەنگانەدا دەردەکەون، وەك گوتراوە: (الشدائد صَيْقَلُ الرجال) سەختییەکان تیغ تیغدەری پیاوانن، وەك چۆن تیغی ڕەسەن خۆی ڕاناگرێ، داوود پێشتر ناوی نەبووە، بەڵام لە مەیدانێدا دەرکەوتوە، هەروەها ئەوەشی لێوەردەگیرێ کە بەپێی شەریعەت خوای دادگەر، ڕێگا لە خەڵك نەبەستراوە، کە کێ چی لە توانادایە بێتە پێش‌و ئەنجامی بدات، داوود مادام پیاوێکی بە توانا بووە، لەبەرئەوە کە پێشتر ناسراو نەبووەو کوڕی فلان کەس نەبووە، ڕێی لێ نەگیراوەو هاتوە، مادام لە توانایدا هەیە بابێ ناوی خوای لێبێنێ‌و بێتە مەیدان.

**مەسەلەی بیست‌و شەشەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ وَءَاتَىٰهُ ٱللَّهُ ٱلْمُلْكَ وَٱلْحِكْمَةَ وَعَلَّمَهُۥ مِمَّا يَشَآءُ ﴾، واتە: وە خوا حوکمڕانیی‌و حیکمەتی پێداو، لەوەی کە دەیەوێ شارەزای کرد، ئەمەش ئەوەی لێوەردەگیرێ، کە هەرکەسێ بە ئیخلاصەوەشان بداتە بەر هەر کارێك، خوا تواناو بڕستی ئەنجامدانی ئەو کارەی بۆ دەڕەخسێنی، داوود سەلامی خوای لێبێ چونکە بە ئیخلاصەوە شانی دابووە بەرێ، خوای تۆڵەستێن جالووتیشی بەدەستی ئەو کوشت‌و دوایش تواناو هۆکارەکانی ئەوەی پێدان، کە لە شوێنی طالووت ببێ بە سەرپەرشتیاری بەنی ئیسرائیل، دیارە ئەوکاتە کە جالووتی کوشتوە پێغەمبەر نەبووە، بەڵام دوایی خوا وەحییشی بۆ ناردوە، وەك لێرەدا دەفەرموێ: ﴿ وَءَاتَىٰهُ ٱللَّهُ ٱلْمُلْكَ وَٱلْحِكْمَةَ وَعَلَّمَهُۥ مِمَّا يَشَآءُ ﴾.

**مەسەلەی بیست‌و حەوتەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ وَلَوْلَا دَفْعُ ٱللَّهِ ٱلنَّاسَ بَعْضَهُم بِبَعْضٍ لَّفَسَدَتِ ٱلْأَرْضُ ﴾، واتە: ئەگەر خوا هەندێك لە خەڵكی بە هەندێکیان پاڵ پێوە نەنێ، سەر زەوی تێکدەچێ، ئەمەش یاسایەکی خوایەو

هەر کاتێك ستەمکاران هەبوون، دەبێ کەسانێك هەبن لە بەرانبەریاندا بوەستن، ئەگەرنا سەر زەوی تێکدەچێ، تێکچوونی سەر زەوی یانی چی ؟ واتە: لە کاتی تاك جەمسەرییدا کە تەنیا یەك دەوڵەتو یەك لایەن دەسەڵاتی هەبێو، هەموو شتی خۆی بەسەر خەڵکدا فەرز بکات، سەرەنجام سەر زەوی تێکدەچێ، دینەکان، کلتوورەکان، بەهابەرزەکان، هەموو شتەکان دەشێوێن، هەموویان دەبنە یەك شێوە، ئێستا ئەمریکا کە دەسەڵاتی هەیە، دەڵێ دەبێ خەڵك وەك من بێ، هەمووی لەسەر دەستووری ئەمریکی بێ، ئەوەتا دیارە دین دەبێ ئەوەی کە لەگەڵ سیاسەتی ئەمریکا ناگونجێ، ئەو ئایەتانە نەخوێنرێنەوە، ئەوەی کە پێچەوانەی سیاسەتی ئەمریکایە، ناگونجێ لە مەنهەجی خوێندندا هەبێ، ئاکارو ڕەوشت هەمووی دەبێ وەك هی ئەمریکا بێ، بەرگو پۆشاك دەبێ وەك هی ئەو بێ، عادەتت، بیرکردنەوەت هەموو شتێکت دەبێ، وەك هی ئەوێ بێ، دیارە لە ئەنجامی ئەوەدا سەرزەمین تێکدەچێ، تەنیا کاتێك تێکناچێ، کە لە بەرانبەری ئەو زوڵمو ستەمەدا کە دەیەوێ خۆی بسەپێنێ، کەسانێك هەبن بەرهەڵستیی بکەن، تەماشا بکەن ئیسلام چەند هانی خەڵك دەدا بۆ بەرهەڵستیی، بۆ جەنگو جیهادو بەرخۆدانو فیداکاریی، دەفەرموێ: ئەگەر جەنگو جیهادو فیداکاریی نەبێ، بەرهەڵستییکردنی ستەمکاران نەبێ، زەوی تێکدەچێ، تەنیا کاتێك تێکناچێ کە جەنگو جیهاد هەبێ، فیداکاریی هەبێ، جوامێریی هەبێ لە بەرانبەر ستەمو خۆسەپاندندا.

**مەسەلەی بیستو هەشتەم:** کە دەفەرموێ: ﴿وَلَـٰكِنَّ ٱللَّهَ ذُو فَضۡلٍ عَلَى ٱلۡعَـٰلَمِينَ﴾، بەڵام خوا خاوەنی بەخششە بەسەر جیهانییانەوە، لێرەدا خوا ﷻ لابردنو پاککردنەوەی خراپەکاران بە چاکەکاران، بە چاکەو بەخششی خۆی دەزانێ، ئەوە نیعمەتی خوایە کە خوای کاربەجێ ژیانی بەشەری وا هەڵخستوە، کە هەمیشە لە بەرانبەری ستەمو چەوساندنەوەو خۆسەپاندندا، خەڵك دەماری غیرەتی بجووڵێ، دەماری بەرهەڵستییکردنی بجووڵێ، ئەوە نیعمەتێکی خوایە کە خوا ئینسانی وا خوڵقاندوە، بەمەرجێك ئەو ئینسانانە

تووشی ئینحرافی میزاجو فیطرەت نەبووبنو تەبیعەتیان تێکنەچووبێو، تووشی خەسێنلدرانو پێشێنرانەوە نەبووبن، ئینسانی سەلیم، ئینسانی تەبیعەت ساغ ئەوەیە کە زوڵم دەبینێ، پێی قەڵس دەبێ، وە کە دیکتاتۆریی ببینێ لە بەرانبەریدا ڕادەوەستێ، ئا ئەوە بەخششێکی خواییە، کە خوای بەدیهێنەر ئینسانی بەو شێوە خولقاندوە.

**مەسەلەی بیستو نۆیەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ تِلْكَ ءَايَٰتُ ٱللَّهِ نَتْلُوهَا عَلَيْكَ بِٱلْحَقِّ ۚ وَإِنَّكَ لَمِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴾، واتە: ئەمانە ئایەتی خوان بە هەق بەسەر تۆیاندا دەخوێنینەوە، وە بێگومان تۆ لە ڕەوانەکراوانی، ئەمە چی لێوەردەگیرێ ؟ ئەوەی لێوەردەگیرێ ئەو ئایەتانە کە ئەم بەسەرهاتانەیان تێدا هەن، تەنیا پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) دەیانزانن کەواتە: ئەی موحەممەد ! ئەو حەقیقەتە مێژووییانەی کە لە چیرۆكو بەسەرهاتەکانی قورئاندا بەسەرتدا دەخوێنرێنەوە، بەڵگەن بۆ تۆ کە تۆ پێغەمبەری خوایو ئەوەت لە خوا وەرگرتوە، چونکە ئەوانە بێجگە لە خوای پەروەردگار کەس نایانزانێ، ئەو هەموو حیکمەتو نهێنییانە کە لە ئایەتەکاندا هەن، بە تەئکید تەنیا لە زانیاری بێسنووری خوای زاناو شارەزاوە، دەگونجێ هەڵقوڵابنو سەرچاوە بگرن، کەواتە: هەر ئەو ئایەتانە خۆیان بەڵگەن لەسەر ڕاستییو سەرڕاستیی پێغەمبەری کۆتایی موحەممەد ﷺ.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی پەنجاو دووەمین

## پێناسـەی ئەم دەرسـە

لـەم دەرسـەماندا خـوای پـەروەردگار پـشتیوان بـێ، پێـنج ئایـەت لـە سـوورەتی (البقرة) دەتوێژینـەوە، ئایەتـەکانی ژمـارە: (٢٥٣ تـا ٢٥٧)، لـەم پێـنج ئایەتـەدا خـوا ﷻ چـەند بابـەتێکی جـۆراو جـۆر دەخاتـەڕوو، یەکێکـیان بریتیـە لـە پێناسـەی پێغەمبـەران (علیهم الصلاة والسلام)، بابەتێکی دیکە خەرجکردنی ماڵو سامانە لە پێنـاوی خـوادا، بابەتێکی دیکە پێناسـەی خوایە ﷻ، لـە دوو تـوێی ئـایەتێکـدا، کە بە (آیة الكُرسـي) ناسراوە، بابەتێکی دیکە پێناسـەی (دین)ە، واتە: ئیـسلام، وە بابەتێکی دیکە ئەوەیـە کە خوا ﷻ سـەبارەت بە بڕواداران چییان بۆ دەکات ؟ وە طـاغووتەکانیش چی بۆ شـوێنکەوتەکانی خۆیـان دەکـەن ؟ ئـەو بابەتانـە لـە دوو توێی ئەو پێنج ئایەتە موبارەکەدا خراونەتـەڕوو.

﴿ تِلْكَ ٱلرُّسُلُ فَضَّلْنَا بَعْضَهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ ۘ مِّنْهُم مَّن كَلَّمَ ٱللَّهُ ۖ وَرَفَعَ بَعْضَهُمْ دَرَجَٰتٍ ۚ وَءَاتَيْنَا عِيسَى ٱبْنَ مَرْيَمَ ٱلْبَيِّنَٰتِ وَأَيَّدْنَٰهُ بِرُوحِ ٱلْقُدُسِ ۗ وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ مَا ٱقْتَتَلَ ٱلَّذِينَ مِنۢ بَعْدِهِم مِّنۢ بَعْدِ مَا جَآءَتْهُمُ ٱلْبَيِّنَٰتُ وَلَٰكِنِ ٱخْتَلَفُوا۟ فَمِنْهُم مَّنْ ءَامَنَ وَمِنْهُم مَّن كَفَرَ ۚ وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ مَا ٱقْتَتَلُوا۟ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يَفْعَلُ مَا يُرِيدُ ﴿٢٥٣﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَنفِقُوا۟ مِمَّا رَزَقْنَٰكُم مِّن قَبْلِ أَن يَأْتِىَ يَوْمٌ لَّا بَيْعٌ فِيهِ وَلَا خُلَّةٌ وَلَا شَفَٰعَةٌ ۗ وَٱلْكَٰفِرُونَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٢٥٤﴾ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلْحَىُّ ٱلْقَيُّومُ ۚ لَا تَأْخُذُهُۥ سِنَةٌ وَلَا نَوْمٌ ۚ لَّهُۥ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ ۗ مَن ذَا ٱلَّذِى يَشْفَعُ عِندَهُۥٓ إِلَّا بِإِذْنِهِۦ ۚ يَعْلَمُ مَا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ ۖ وَلَا

يُحِيطُونَ بِشَيْءٍ مِّنْ عِلْمِهِۦٓ إِلَّا بِمَا شَآءَ ۚ وَسِعَ كُرْسِيُّهُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ ۖ وَلَا يَـُٔودُهُۥ حِفْظُهُمَا ۚ وَهُوَ ٱلْعَلِيُّ ٱلْعَظِيمُ ﴿٢٥٥﴾ لَآ إِكْرَاهَ فِى ٱلدِّينِ ۖ قَد تَّبَيَّنَ ٱلرُّشْدُ مِنَ ٱلْغَىِّ ۚ فَمَن يَكْفُرْ بِٱلطَّٰغُوتِ وَيُؤْمِنۢ بِٱللَّهِ فَقَدِ ٱسْتَمْسَكَ بِٱلْعُرْوَةِ ٱلْوُثْقَىٰ لَا ٱنفِصَامَ لَهَا ۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿٢٥٦﴾ ٱللَّهُ وَلِىُّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ يُخْرِجُهُم مِّنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ ۖ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ أَوْلِيَآؤُهُمُ ٱلطَّٰغُوتُ يُخْرِجُونَهُم مِّنَ ٱلنُّورِ إِلَى ٱلظُّلُمَٰتِ ۗ أُو۟لَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِ ۖ هُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿٢٥٧﴾ ﴾.

## مانای وشە بە وشەی ئایەتەکان

((ئەو ڕەوانەکراوانە - واتە: پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) - هەندێکیانمان بەسەر هەندێکیاندا هەڵبژاردوە، هی وایان تێدا بووە کە خوا دواندوویەتی، وە هەندێکیانی بەچەند پلە بەرز کردۆتەوە، وە بەڵگە ڕۆشنەکانمان بە عیسای کوڕی مەریەم بەخشی بوون، وە بە گیانی پاك پشتگیریمان کردبوو، وە ئەگەر خوا ویستبای (ڕێیان لێبگرێ) ئەوانەی دواییان پاش ئەوەی بەڵگە ڕۆشنەکانیان بۆ هاتن، پێکەوە تووشی شەڕو کوشتار نەدەبوون، بەڵام تووشی دووبەرەکیی بوون، هەیانبوو ئیمانی هێناو هەشیان بوو کافر بوو، وە ئەگەر خوا ویستبای (ڕێیان لێبگرێ) پێکەوە بەشەڕ نەدەهاتن، بەڵام خوا هەرچییەکی بوێ دەیکات ﴿٢٥٣﴾ ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! لەوەی پێمانداون ببەخشن بەر لەوەی ڕۆژێك بێت، کە کڕینو فرۆشتنو دۆستایەتییو تکاکردنی تێدانیە، وە کافران ستەمکارن ﴿٢٥٤﴾ خوا - تعالى - جگە لەو هیچ پەرستراوی دی بە هەق نین، زیندووی مشوورگێڕە، نە وەنەوز دەیگرێ، نە خەو، هەرچی لە ئاسمانەکانو زەویدایە هی ویە، کێ هەیە بێ مۆڵەتی وی تکای لەلا بکات! هەرچی لەپێش دەستیانەوەیەو لە دوایانەوەیە دەیزانێ، وە مەگەر خۆی بیەوێ ئەگەرنا دەوری هیچ لە زانیاری وی نادەن، کورسییەکەی ئاسمانەکانو زەوی گرتۆتە خۆی، وە پاراستنی بۆیان ماندووی ناکات،وە ئەو بەرزی مەزنە ﴿٢٥٥﴾ تۆبزیی کاریی لە ئاییندا نیە،سەرراستییو گومڕایی

لە یەکدی جیابوونەتەوە، جا هەرکەس کوفر بە طاغووت بکاو بڕوا بە خوا بێنێ، ئەوە دەستی بە قوڵفەیەکی قاییم گرتوە، کە لە پچڕان نایەت وە خوا بیسەری زانایە ﴿٢٥٦﴾ خوا دۆستی ئەوانەیە بڕوایان هێناوە، لە تاریکاییەکانەوە بەرەو ڕووناکیی دەریاندێنێ، وە ئەوانەی بێبڕوان دۆستەکانیان طاغووتەکانن، لە ڕووناکییەوە بەرەو تاریکییەکان دەریاندێنن، ئەوانە خاوەنی ئاگرن و بە هەمیشەیی تێیدان ﴿٢٥٧﴾)).

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(ٱلْبَيِّنَٰتِ): (البَيِّنَات جَمْعُ بَيِّنَة: الدَّلاَلَةُ الوَاضِحَة)، واتە: (بینات) كۆی (بَيِّنَةَ)یەو ئەمیش ئاوا پێناسە كراوە: (الدَّلاَلَة الوَاضِحَة عَقْلِيَةً كَانَتْ أو مَحْسُوسَة، سُمِّيَ شَهَادَةُ الشَّاهِدَينِ بينةً كَمَا جَاءَ فِي صحيح مسلم: البَيِّنَةُ عَلَى المُدَّعِي) (بَيِّنَةَ)واتە: ڕێنیشاندانێکی ئاشکرا، بەڵگەیەکی ئاشکرا، چ عەقڵیی بێ، چ بەرهەست بێ، بۆیە شایەدییدانی دوو شاهێدان پێی گوتراوە: (بَيِّنَةَ) چونکە بەڵگەیەکی ڕوون و ئاشکرایە یاخود ڕێنیشاندەرێکی ئاشکرایە، کە ئەو شتە بەوجۆرە بووە، وەك لە فەرمایشتی پێغەمبەردا ﷺ. هاتوە فەرموویەتی: (البَيِّنَةُ عَلَى المُدَّعِي)، واتە: کەسێك ئیددیعایەك بکات دەبێ بەڵگەیەکی ڕوون بێنێ، واتە: دوو شاهید، یان هەر بەڵگەیەکی دیکە کە دەعوایەکەی ئیسپات بکات.

(بِرُوحِ ): ڕووح بە مانای (گیان) دێ، ئەوەی کە کوردەواریی پێی دەڵێن: (گیان) پێکهێنەری سەرەکیی ئینسانە، ئینسان لە دووبەش پێکدێت لە ڕووح و جەستە، ڕووح تەنیا خوا دەزانێ چۆنە؟ جەستەش ئەوە دیارە لەو خاکە دروست بووە، کە لەسەری دەژین.

(ٱلْقُدُسِ ): واتە: پاك، یەكێ لە سیفەتەکانی خوای پەروەردگار (قُدُّوس)ە، وە (قَدَّسَهُ) واتە: بەپاکی گرت، ئەهلی تەصەووف دەڵێن: (قُدِّسَ سِرُّهُ، قُدِّسَ رُوحُهُ) واتە: ڕووحی پاکبێ، دیوی پەنهانی پاکبێ، وە لێرەدا وشەی (روح القُدُس)

گیانی پاك، نازناوە بۆ (جبریل) ، كە وەحی بۆ پێغەمبەر هێناوە، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ قُلْ نَزَّلَهُ رُوحُ الْقُدُسِ مِن رَّبِّكَ بِالْحَقِّ ... ﴿١٠٢﴾ ﴾ النحل، واتە: بڵێ ئەم قورئانە (روح القدس) لە پەروەردگارتەوە بە هەق دایبەزاندوە، وە لە سوورەتی (القدر)یشدا دەفەرموێ: ﴿ تَنَزَّلُ الْمَلَائِكَةُ وَالرُّوحُ فِيهَا بِإِذْنِ رَبِّهِم مِّن كُلِّ أَمْرٍ ﴿٤﴾ ﴾ القدر، لەو شەوەدا فریشتەكانو ڕووح (واتە: جبریل) دادەبەزن بە فەرمانی پەروەردگاریان، بۆچی جیبریل ناونراوە: (روح القدس)؟ دەڵێ: (سُمِيَ جبريلُ روحُ القُدس، لأنَّهُ يَنزِلُ بالقُدُس مِنَ الله) بۆیە جیبریل ناونراوە: (روحُ القُدس)، چونكە پاكیی لە خواوە دادەبەزێنێ (أي بِمَا يُطَهِّرُ بِهِ نفوسَنَا مِنَ القُرآن والحِكْمَة والفَيضُ الإلهي)، واتە: شتێك دێنێ (لە خواوە) لە قورئانو حیكمەتو بەخششی خوایی كە نەفسەكانمان پاك دەكاتەوە.

(**خُلَّةٌ**): (الخُلَّة: المَوَدَّة) واتە: خۆشەویستیی، ئنجا بۆچی خۆشەویستیی وشەی (خُلَّة)ی بۆ بەكارهاتوە؟ (لأنَّهَا تَتَخَلَّلُ النَّفْسَ، أي تَتَوَسَّطُهَا)، چونكە تێكەڵ بە دڵو هەناوی ئینسان دەبێو دەچێتە نێوی.

(**ٱلْحَىُّ**): (الدَائِم الحَياةُ بِلاَ زَوَال)، واتە: ئەوەی كە هەمیشە زیندووو خاوەنی ژیانەو ژیانی لێ لاناچێ.

(**ٱلْقَيُّومُ**): (القَائِم الحَافِظُ لِكُلِّ شَيءٍ والمُعْطِي لَهُ مَا بِهِ قِوَامُهُ)، (القيّوم): ئەو كەسەی كە چاودێرە، وە پارێزەرە بۆ هەموو شتێك، وە بۆ هەر شتێك ئەوەی كە پێی بەرێوەدەچێ پێی ڕادەوەستێ پێی دەبەخشێ.

(**سِنَةٌ**): (السِّنَةُ: الوَسَنُ والغَفْلَةُ والغفوة، وَرَجُلٌ وَسِنَان نَعْسَان)، (السِّنَةُ) واتە: وەنەوز، پێشەكی خەوتن، ئینسان پێش ئەوەی خەوی لێبكەوێ، دەڵێن: وەنەوزی هاتێ كە بریتیە لە خەوێكی كەم كە بەسەرتدا دێ، یاخود بێئاگاییەك، وە دەگوترێ: (رَجلٌ وَسْنَان) واتە: پیاوێكی خەواڵوو، وەنەوزگرتوو.

(كُرۡسِيُّهُ): وشـەی (كُرسِي) لێرەدا زۆربـەی زانایـان بـە زانیارییـان لێکداوەتـەوە (كرسيه: عَلمهُ) واتە زانیاری خـوا، هەندێکیشیان دەڵـێن (كُرسِـي)، واتـە دەسـەڵاتی خـوا ﷻ، وایـان لێکـداوەتەوە، وە هەندێکـیش (كُرسِـي)یـان بـەوە لێکداوەتەوە کە جیسمێکی گەورەیە دەورەی ئاسمانـەکان و زەوی داوە، وەك لـە فەرموودەیەکدا کە (إبن حبـان) بـە (صحيح)ی دانـاوە هاتوە {(مَـا السَّمَاوَاتِ السَّبْع في الكُرسِي إلاَّ كَحَلَقَةٍ بِـإِرْضٍ فَـلاَةٍ) (رَوَاهُ ابْنُ حِبَّانَ بـرقم: (٣٦١)} واتە: حەوت ئاسمانەکان لەچاو کورسی وەك ئەنگوستیلەیەك وان لە بیابانێکدا، واتە: (كُرسِي) ئەوەندە لەوان گەورەترە، بەڵام مانایەك کە زیاتر زانایان لەسەری داکۆکییان کردوە، ئەوەیە کە کورسی بەمانای زانیاریە، یان بەمانای دەسەڵاتە.

(يَـُٔودُهُۥ): (يُتْعِبُـهُ، آدَهُ يَـؤُدُهُ: أتعبـهُ يُتْعِبُـهُ) مانـدووی دەکـات ﴿وَلَا يَـُٔودُهُۥ﴾، واتـە: مانـدووی ناکـات، دەگـوترێ: (آدَهُ أي: أتْـعَبَهُ) مانـدووی کـرد ﴿وَلَا يَـُٔودُهُۥ حِفۡظُهُمَا﴾، واتـە: پاراستنی خـوای پـەروەردگار بـۆ ئاسـمانەکان و زەوی خـوای باڵادەست ماندوو ناکات.

(إِكۡرَاهَ): (الإكْرَاه: حَمْـلُ الإنسَانِ عَلَـى مَـا يَكره)، (إكْراه) ئەوەیـە کـە کەسێك ناچار بکەی شتێك بکـات، کە پێی ناخۆشـبێ.

(ٱلرُّشۡدُ): واتـە: سـەر ڕاسـتیی، دەڵـێ: (الرَّشَدُ والرُّشْدُ: خِلاَفُ الغَـيِّ، يُسْتَعْمَلُ إسْتِعْمَالَ الهدَايةِ)، (الرَّشَدُ والرُّشْدُ) پێچەوانەی (غَيّ)ەو لە زمـانی عەرەبیدا دژی یـەکن، وە لـەجیاتی هیدایـەت بـەکاردێ، بـەڵام مـن پـێم وایـە (الرُّشْدُ) بەرهـەمی وەرگـرتنی هیدایەتـە، وەك چـۆن (غَـيّ) بەرهـەمی گـومڕایی (ضلالة)ە، واتـە: هەر کەسێك (ضَالّ) بـوو (غَـيّ) تـووش دێ، وە هەرکەسێك (مُهتَدي) بوو (رُشْد)ی دێتـە دەست.

(بِٱلطَّٰغُوتِ): طـاغووت لە (طَغَى)وە هـاتوە (طَغَى يَطغِى) واتـە: یاخی بوو، یاخی دەبێ، وە طاغووت (صِيغَة مبَالَغَة)یـە، یـان هـەر نـاوە لـە (طُغيـان)ەوە هـاتوە،

(طُغيان) چییە؟ (تَجَاوُزُ الحَدِّ فِي العِصْيَانِ) ئەوەیە لە سەرپێچیی و گوناهدا ئینسان هەموو سنوورەکان ببەزێنێ و هەرشتێك سنوور ببەزێنێ وشەی (طَغَى)و (طُغيَان)ی بۆ بەکاردێ، وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿إِنَّا لَمَّا طَغَا ٱلْمَآءُ حَمَلْنَٰكُمْ فِى ٱلْجَارِيَةِ ﴿١١﴾﴾ الحاقة، واتە: ئێمە کاتێك ئاوەکە هەموو سنووری بەزاند، ئێوەمان هەڵگرت لە کەشتییەکەدا، کە مەبەست پێی کەشتی نووحە.

(والطَّاغُوتُ عِبَارَةٌ عَنْ كُلِّ مَعْبُودٍ سِوَى اللهِ) واتە: طاغووت هەر پەرستراوێکە جگە لە خوا ﷻ، وە دەشگونجێ طاغووت هەموو ئەو سەرکردانەبن کە پێش خەڵك دەکەون بەڕێی ناشەرعییداو بە غەیری ڕێگای خوادا.

(ٱلْغَيِّ): (الغَي: جَهْلٌ عَن اعتِقَادٍ فَاسِدٍ)، (غيّ) نەزانییەکە لە بیروبڕواو قەناعەتێکی هەڵەوە دروست دەبێت.

(بِٱلْعُرْوَةِ): (عروة) واتە: قوڵفە، بە مانای هەنگڵی دیزەو گۆزەو ئەو شتانەش دێ، دەڵێ: (العُرْوَةُ: مَا يُتَعَلَّقُ بِهِ مِن عُرَاهُ، أَي: نَاحِيَتِهِ والجَمْعُ: العُرَى)، واتە: (عروة) هەرشتێکە دەستی پێوە بگیرێ لەلایەکییەوەو کۆیەکەی (عُری)یە.

(ٱلْوُثْقَىٰ): (الوُثْقَى مُؤَنَّثَةُ الأَوثَق)، (أوثق): واتە: زۆر پتەو (مؤنَّث)ەکەی (وُثقى)یە.

(لَا ٱنفِصَامَ لَهَا): واتە: ناپچڕێ (الفَصْمُ الصَدْعُ دُونَ إِنفِصَال والإنفِصَامُ هُوَ الشَّق والإنكِسَار)، واتە: (فَصْم) بریتیە لە درزبردنێك بەبێئەوەی لێی جیابێتەوە، وە (إِنْفِصَام) بریتیە لە شەق بوون و شکان.

(وَلِيُّ): بە مانای دۆستو خۆشەویستو پشتیوان و یارمەتیدەرو سەرپەرشتیار دێ، هەموو ئەو مانایانەی هەیە، وە ئەسڵی وشەی (ولي): (الوَلاءُ والتَّوالِي: أنْ

يحصُلَ شَيْئَانِ فَصَاعِداً حُصُولاً لَيْسَ بَيْنَهُما مالَيْسَ مِنْهُما، ويُسْتَعارُ ذَلِكَ لِلقُرْبِ)، ئەوەیە کە دوو شت بەدوای یەکدا بێن هیچ شتێکی دیکەی غەیری خۆیان نەکەوێتە نێوان، واتە: کە گوترا: فلان کەس وەلی خوایە، یانی: لەنێوان ئەوو خوادا شتێکی دیکە نیە.

(أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِ): (أصحَاب) کۆی (صاحِب)ە، هەم بە مانای هاوەڵ دێتو هەم بە مانای خاوەن دێت، واتە: ئەوانە دەبن بە خاوەنی دۆزەخ، یان دەبن بە ڕەفیقو هاوەڵی دۆزەخ.

## هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتەکان

هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو ڕستە قورئانییەی کە دەفەرموێ ﴿ لَآ إِكۡرَاهَ فِي ٱلدِّينِ ﴾ تۆبزیی لێکردنو ناچارکردن لەدیندا نیە:

١/ {(عَنِ ابنِ عَبَّاسٍ، قَالَ: كَانَتْ المَرْأَةُ تَكُونُ مِقْلاةً فَتَجْعَلُ عَلَى نَفْسِهَا إِنْ عَاشَ لَهَا وَلَدٌ أَنْ تُهَوِّدَهُ، فَلَمَّا أُجْلِيَتْ بَنُو النَّضِيرِ كَانَ فِيهِمْ مِن أبنَاءِ الأنْصَارِ، فَقَالُوا لاَ نَدَعُ أَبْنَاءَنَا، فَأَنْزَلَ اللهُ ﷻ: ﴿ لَآ إِكۡرَاهَ فِي ٱلدِّينِ ﴾) (رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ برقم: (٢٦٨٢)، وَالنَّسَائِيُّ في (الكبرى) برقم: (١٠٩٨٣) وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (١٤٠)، والصحيح المُسند مِن أسباب النزول، ص (٤٧) لمُقبل بن هادي الوادعي، وَصَحَّحَهُ الألباني في (سنَن أبِي داوُدَ)}، واتە: عەبدوڵلای کوڕی عەبباس دەڵێ: لەسەردەمی نەفامییدا وادەبوو لە خەڵکی (یثرب) ئافرەتێك منداڵی بۆ نەدەژیا (منداڵەکانی بە گچکەیی دەمردن) لەسەر خۆی نەزر دەکرد، کە ئەگەر لەمەودوا منداڵێکی بوو وە بژییو بمێنێ، دەیکاتە جوولەکە {چونکە ئەوانە زانیویانە کە جوولەکەکان خاوەن کتێبنو گوتوویانە ئەوانە لە خوا نزیکترن، گوتوویانە: خوایە لەسەرمان نەزر بێ ئەگەر ئەوجارە منداڵەکەمان بۆ ژیا بیکەینە جوولەکە} جا کاتێك (بنو

النَّضير) {كە تیرەیەك بوون لە جوولەكەكان} لە مەدینە وەدەرێنران كە هەندێك لە منداڵی ئەنصارییەكانیشیان لەنێو دابوون، دایكو باوكیان گوتیان: لێناگەڕێین كوڕەكانمان لەگەڵ جوولەكەكان بڕۆن، ئیدی خوای پەروەردگار ئەم ڕستە قورئانییەی ناردە خوارێ: ﴿ لَآ إِكۡرَاهَ فِي ٱلدِّينِۖ ﴾، واتە: تۆبزییكردن نیە لە فەرزكردنی ئیسلامداو، نابێ بەزۆر ئیسلام بەسەر كوڕەكانتاندا فەرز بكەنو بڵێن دەبێ هەر بگەڕێنەوە بۆ ئیسلام، چونكە ئیسلام دەبێ بە قەناعەتەوە، بە عەقڵو بە تێگەیشتنەوە هەڵبژێردرێ.

**ب/** هەروەها هەر لەوبارەوە ئەم گێڕانەوەیەش هەیە: {(أَخْرَجَ ابن جَرير عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنه قَالَ: نَزَلَتْ: ﴿ لَآ إِكۡرَاهَ فِي ٱلدِّينِۖ ﴾ فِي رَجُلٍ مِنَ الأنْصَارِ مِن بَنِي سَالم بن عَوْف يُقَالَ لَهُ: الحُصَين، كَانَ لَهُ ابْنَان نَصْرَانيّان، كَانَ هُوَ مسلماً فَقَالَ للنَّبِي ﷺ: ألاَّ أسْتَكْرِهُهُمَا فإنَّهُمَا أبيَا إلاَّ النَّصرَانيَة ؟! فَأنْزَلَ الله الآية)}[1]، عەبدوڵڵای كوڕی عەبباس خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ: ئەم ڕستە قورئانییە دەربارەی پیاوێك لە پشتیوانان هاتە خوار لە بەنی سالیمی كوڕی عەوف، كە ناوی حوصەین بوو، دوو كوڕی هەبوون، كوڕەكانی نەصرانیی بوون، بۆ خۆشی مسوڵمان بوو، بە پێغەمبەری گوت: ئایا زۆرییان لێنەكەم بیانگێڕمەوە بۆ ئیسلام، چونكە دەڵێن: هەر نەصرانیی دەبین؟! خوای پەروەردگاریش ئەم ئایەتەی ناردە خوار، كە: نەخێر زۆریان لێمەكە، كابرا كە مسوڵمان دەبێ، دەبێ زۆر مەمنوونیش بێ كە مسوڵمان بێو خوا بپەرستێ، بەڵام ئێمە زۆری لێبكەین خۆ بەتۆبزیی لێكردن ئینسان نابێتە مسوڵمان، بەڵكو لە كوفری ئاشكراوە دەیگوازینەوە بۆ كوفری پەنهانو، لە كافرێتییەوە دەیگوازینەوە بۆ مونافیقێتی، كە خراپتریشە لە كافرێتی !

---

١) (لُبـاب النقـول فـي أسـباب النـزول للـسيوطي، ص: (٧٦)، وَصَحيح أسباب النزول، ص: (١٥) لإبراهيم محمد العلي)، ص: (١٥).

## مانـــای گشــتی ئایەتەکــان

خـوای پـەروەردگار پـاش ئـەوەی کـە بەسـەرهاتی طـاڵووتو جاڵووتی گێڕایـەوە، دەفەرموێ: ﴿ تِلْكَ ٱلرُّسُلُ فَضَّلْنَا بَعْضَهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ ﴾، ئا ئەو پێغەمبەرانە صەڵاتو سـەلامی خوایـان لەسـەر بێـت، {ئـەوانـەی کـە ناویـان هـاتوە لـەم سـوورەتەدا، وە ئەوانەی کە ناویان نەهاتوەو لە سوورەتەکانی دیکەدا ناویان هاتوە کـە دیـارە پـێش سـوورەتی بەقــەرە ســوورەتی زۆر لــە ســوورەتە مەکییــەکان دابــەزیون، ئــەو پێغەمبەرانە} هەندێکیانمان بەسـەر هەندێکـیاندا هەڵبژاردوەو هەندێکـیان پلـەو پایەمان بەرزتر کردۆتەوە بەسەر هەندێکیاندا ﴿ مِّنْهُم مَّن كَلَّمَ ٱللَّهُ ﴾، هەیان بووە کە خوا دواندوویەتیو قسەی لەگەڵـدا کـردوە، کـە مووسـایە ﷺ و دواییـش زیـاتر تیـشك دەخەینـە سـەر ئـەو مەسـەلەیە ﴿ وَرَفَعَ بَعْضَهُمْ دَرَجَٰتٍ ﴾، وە هەشـیانە چەندان پلە بـەرزی کردوونەتـەوە، وەك ئیبـراهیمو موحەممـەد (علیهمـا الـصلاة الــسلام) ﴿ وَءَاتَيْنَا عِيسَى ٱبْنَ مَرْيَمَ ٱلْبَيِّنَٰتِ وَأَيَّدْنَٰهُ بِرُوحِ ٱلْقُدُسِ ﴾، وە بەڵگــە ئاشـکراکانمان دان بـە عیـسای کـوڕی مەریـەم، وە پـشت گیـرییـشمان کـرد بـە (روح القدس) واتە: جبـریل، چونکـە جبـریل هەمیشە لەگەڵیدا بوو، وەك چۆن جبـریل هەمیشـە لەگەڵ پێغەمبەری خۆشمان بوو، بەڵگە ڕوونو ئاشکراکانی کـە دراون بـە عیـسا ﷵ بـۆ نموونـە: کـوێری زگمـاكو، کـەرو لاڵـی زگمـاكو، بەڵـەكو ئـەو نەخۆشـانەی کـە بـە کـەس چارەسـەر نـەکراون، عیـسا ﷵ بـە فـەرمانی خـوای پەروەردگار چارەسـەری کـردوون، وە لـە هـەمووی گرنگتـر ئـەوەبووە کـە مـردووی زیندوو کردۆتەوە، وە لـە قـوڕ باڵنـدەی دروسـت کـردوەو فـووی پێـدا کـردوە، بۆتـە باڵنــدەو فڕیــوە ﴿ وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ مَا ٱقْتَتَلَ ٱلَّذِينَ مِنۢ بَعْدِهِم ﴾، وە ئەگــەر خــوا ویــستبای شــوێنکەوتووانی پێغەمبــەران لــەدوای وان پێکــەوە بەشــەڕ نــەدەهاتن، چونکە زۆر جـار ئەهلی یـەك دین، دوایی بیـروبۆچوونی جیـاجیـایان پەیـدا دەبێ دەربـارەی هەنـدێ لـە مەسـەلەکانی دیـن، یـاخود لەبـەر هـەواو ئـارەزوو، وە لەبـەر

زەعامەتو خۆ فەرزکردن پێکەوە بەشەڕ دێن، ئەوە شتێکی ئاشکرایە جا خوا دەفەرموێ: ئەگەر خوا ویستبای بەشەڕ نەیەنو پێکەوە کوشتار نەکەن، ڕێی لێدەگرتن، ئەگەر ویستبای زۆریان لێبکات، بەلاّم خوای بالاّدەست ویستوویەتی خەڵك ئازاد بکاتو بە ویستی ئازادانەی خۆیان بجووڵێنەوە، ویستوویەتی خەڵك ئازادبێ، جا کە ئازادی کردوون، ئەو حاڵەتەو ئەو دیاردە خراپەیە کە بریتیە لە شەڕو کوشتارو خوێن ڕێژیی لەنێوانیاندا پەیدابووە ﴿ مِّنۢ بَعۡدِ مَا جَآءَتۡهُمُ ٱلۡبَيِّنَٰتُ ﴾، دوای ئەوەی کە بەلگە ڕوونەکانی بۆ ناردوون، ئەگەر ڕێی لێگرتبان، دەیتوانی ڕێیان لێبگرێ ﴿ وَلَٰكِنِ ٱخۡتَلَفُواْ ﴾، بەلاّم خوای بێهاوتا ئازادی کردنو ئەوانیش لەنێو خۆیاندا ڕاجیاییان پەیدابووو ناکۆکییان پەیدابوو ﴿ فَمِنۡهُم مَّنۡ ءَامَنَ وَمِنۡهُم مَّن كَفَرَ ﴾، هەیانبوو ئیمانی هێناو هەشیانبوو کافربوو ﴿ وَلَوۡ شَآءَ ٱللَّهُ مَا ٱقۡتَتَلُواْ ﴾، خوای کاربەجێ دووبارەی دەکاتەوە، تاکو هیچ کەس وا گومان نەبات کە ئەوانە بەشەڕ هاتوون بۆ وێنە: جوولەکەو نەصرانیی پێکەوە، یاخود جوولەکەو ئیدیکە پێکەوە، یاخود جوولەکەکان لەنێو خۆیاندا، یاخود نەصرانیی یەکان لەنێو خۆیاندا، بۆ ئەوەی هیچ کەس گومانی بۆ پەیدا نەبێ، کە ئەوە چۆنە وا بەشەڕ هاتوون ! لەگەڵ ئەوەشدا کە خوای زاناو توانا پێشی ناخۆشە ؟! ڕاستە خوا پێی ناخۆشە، بەلاّم خوای بێ هاوەڵ ویستوویەتی خەڵك ئازاد بکاتو کە ئازادی کردوون شەڕو کوشتار لەنێوانیاندا پەیدابووەو ئێستاش بەردەوام هەیە ﴿ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يَفۡعَلُ مَا يُرِيدُ ﴾، بەلاّم خوا ئەوە دەکات کە دەیەوێو هەرچی بیەوێ دەیکات، بەلاّم بێگومان خوای زاناو توانا ئەوەی کە دەیەوێو دەیکات لەمیانەی ئەو یاسایانەوە دەیکات کە دایناون.

ئنجا دێتە سەر بابەتێکی دیو دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَنفِقُواْ مِمَّا رَزَقۡنَٰكُم ﴾، ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە ! لەوەی کە پێمان داون ببەخشنو لە پێناوی خوادا خەرجی بکەن ﴿ مِّن قَبۡلِ أَن يَأۡتِيَ يَوۡمٞ لَّا بَيۡعٞ فِيهِ وَلَا خُلَّةٞ وَلَا شَفَٰعَةٞ ﴾

، پێش ئەوەی ڕۆژێك بێ كە نەكڕینو فرۆشتنی تێدایە (بڵێن: خۆتان بكڕنەوە یان فیدیە بدەن) نە دۆستایەتییو هاوەڵایەتیی تێدایە (بڵێن: ڕەفیقێك، دۆستێك یارمەتیان دەدا) وە تكاكردنیشی تێدانیە كەس ناتوانێ بەبێ ڕەزامەندیی خوای پەروەردگار تكا بۆ كەس بكات، تەنانەت پێغەمبەرانیش وەك خوا تبارك وتعالی لە جێی دیكە دەفەرموێ: ﴿ ...وَلَا يَشْفَعُونَ إِلَّا لِمَنِ ٱرْتَضَىٰ ...﴿٢٨﴾ ﴾الأنبياء، فریشتەكان تكا ناكەن مەگەر بۆ كەسێك كە خوا لێی ڕازی بێ، ئەوە دیارە خوای دادگەریش لە ئینسانی كافر ڕازی نابێ، هەروەها لەوانەی كە گوناهی گەورەیان هەیە مادام پاك نەبوونەتەوەو تۆبەیان نەكردوە، لێیان ڕازی نابێ، كەواتە: پێغەمبەریش ﷺ وە فریشتەكانیش ناتوانن شەفاعەتیان بۆ بكەن ﴿ وَٱلْكَٰفِرُونَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴾، وە كافرەكان ستەمكاری ڕاستەقینەن، چونكە زوڵمو ستەمیان لە خۆیان كردوەو ستەمیان لە دینی خوای زاڵو مەزن كردوەو، ستەمیان لە خەڵك كردوەو ستەمیان لە پەیامبەرانی خوا كردوە، كە هاتوون ئیمان فێری خەڵك بكەن، بەڵام ئەوان كوفریان هەڵبژاردوە.

ئەوەی تێبینی دەكرێ خوای بەخشەر ئەم مەسەلەی ماڵ خەرج كردنە، كە لێرەدا هێناویەتی، پێش (آية الكرسي)و، لە دوای ئایەتێكی دیكە دێ كە باسی مێژووی پێغەمبەرانو شوێنكەوتووانیان دەكات، وەك جاری دیكەش باسمان كردوە كە ئەم جۆراوجۆركردنەی ئەو بابەتانە بۆتە جێی پرسیار بۆ هەندێ لە توێژەرانو لە زانایان كە چۆنە خوای پەروەردگار لە بابەتێكەوە دەچێتە سەر بابەتێكی دیكەو تێكەڵیان دەكاتو تێهەڵكێشیان دەكات ؟ وەڵامەكەی ئەوەیە كە ژیانیش هەروایەو، قورئانیش كتێبی ژیانە، ئێستا ئێمە ئەم دەرسە دەخوێنین، دوای ئەوە دەچین كارێكی دیكە دەكەین، دوایی مامەڵەو بازرگانیی دێتە پێشێ، دوایی ئیشێك دێتە پێشێو دەچینە بازاڕ دەیكەین، دوایی دوو نەفەر پێكەوە كێشەكیان لەنێواندا دەبێ دەچین صوڵحیان لەنێواندا دەكەین، دوایی ئینسان دەچێتەوە بۆ لای ماڵو خێزانی ئیشێكی دیكەی دێتە پێش، ئیشی سیاسی دێتە پێش، بۆیە خوای پەروەردگار كتێبی خۆی وەك ژیانی خەڵك چۆن ژیانی خەڵك تێكەڵە: عیبادەت،

عادەت، موعامەلات، صولْح، ئاشتی، شەڕ، ئەو شتانە هەموو تێکهەڵکێشن‌و بەدوای یەکدا دێن، کتێبەکەشی ئاوایەو وەك کتێبێك کە مرۆڤ دایدەنێ نیە، ئەوە (باب الطهارة)یە باسی پاك‌و خاوێنی دەکات‌و ئەوەیان باسی نوێژ دەکات‌و ئەوەیان باسی ڕۆژووگرتن دەکات‌و ...هتد، چونکە ژیان بۆخۆی وانیە، ژیان ئەوەنیە بڵێی مرۆڤ لە قۆناغێکدا هەر خەریکی دەستنوێژ بێ، دوایی هەر خەریکی نوێژ بێ، دوایی هەر خەریکی ڕۆژوو بێ، بەڵکو لە هەمان کات کە بە ڕۆژووی نوێژیش دەکەی‌و، کە دەستنوێژیش هەڵدەگری یەکسەر نوێژیش دەکەی، ...هتد.

ئنجا باسی گەورەترین ئایەت: (آية الكرسي) دەکات چونکە ئەم ئایەتە، وەك دوایی باسی دەکەین گەورەترین ئایەتە لە قورئاندا لە ڕووی نێوەڕۆکەوە، نەك درێژترین ئایەت‌و گەورەترین ئایەت لەڕووی قەبارەو وشەکانیەوە، دەفەرموێ: ﴿ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ﴾، خوا، بێجگە لەو هیچ پەرستراوی دیکە نیە ﴿ ٱلْحَيُّ ٱلْقَيُّومُ ﴾، زیندوویە بە ژیانێکی هەمیشەیی، وە سەرپەرشتیارو مشوورخۆرە، ﴿ لَا تَأْخُذُهُۥ سِنَةٌ وَلَا نَوْمٌ ﴾، نەوەنەوز دەیگرێ نەخەوی دێ، جا مادام سەرپەرشتیی بوون‌و کائینات بکات، چۆن دەگونجێ نەك خەو، هەر وەنەوزیشی هەبێ؟! ﴿ لَّهُۥ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ ﴾، چی لە ئاسمانەکان‌و زەویدا هەیە، هی ویە ﴿ مَن ذَا ٱلَّذِى يَشْفَعُ عِندَهُۥٓ إِلَّا بِإِذْنِهِۦ ﴾، نەك هەر هیچ کەس خاوەنی هیچ شتێك نیە، بەڵکو هیچ کەس تواناى تکاکردنیشی نیە لەلای ئەو ﴿ إِلَّا بِإِذْنِهِۦ ﴾، مەگەر ئەو مۆڵەتی بدات‌و بڵێ تکا بکە! ئنجا خوای کاربەجێش بۆ کێ مۆڵەت دەدا؟ لە شوێنی دیکە فەرموویەتی ﴿ ...وَلَا يَشْفَعُونَ إِلَّا لِمَنِ ٱرْتَضَىٰ ... ﴿٢٨﴾ ﴾ الأنبياء، خوای بێنیاز بۆ کەسێك مۆڵەت دەدا تکای بۆ بکرێ کە لێی ڕازیبێ ﴿ يَعْلَمُ مَا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ ﴾، ئەوەی لە پێشیانەوەیەو ئەوەی لە دوایانەوەیە هەمووی دەزانێ، واتە: داهاتوو دەزانێ کە لە پێشیانەوەیەو جارێ نەهاتوە، وە ڕابردووش دەزانێ کە لە دوایانەوەیەو بە جێیان هێشتوە، هەمووی دەزانێ، کێ

ڕابردوو هەمووی دەزانێ داهاتووش هەموو دەزانێ؟ بەس خوا ﷻ، ئێمە بەس ئێستا دەزانین، بگرە ئێستاش هەمووی نازانین، بەڵکو ئەوەی کە لە نزیکمانە دەیزانین ﴿وَلَا يُحِيطُونَ بِشَيْءٍ مِّنْ عِلْمِهِۦٓ إِلَّا بِمَا شَآءَ﴾، دروستکراوەکان هیچ شتێك لە زانیاری خوا نازانن، مەگەر ئەوەی بۆخۆی بیەوێ، ئێمە دەتوانین چی بزانین؟ هەر ئەوە کە خوای زانا مۆڵەتی داوەو بۆخۆی دەرفەتمان دەداتو توانای زانینی پێداوین، هەر ئەوەندە دەتوانین بزانین ﴿وَسِعَ كُرْسِيُّهُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ﴾ زانیارییەکەی، یان دەستەڵاتو حوکمڕانیی خوا ﷻ ئاسمانەکانو زەوی گرتۆتەوە ﴿وَلَا يَـُٔودُهُۥ حِفْظُهُمَا﴾، لێرەدا پرسیارێك دروست دەبێ: باشە خوا ﷻ وەنەوزی نەبێو خەوی نەبێو ئیسراحەتی نەبێ {واتە: ماندوو نەبێ تاکو ئیسراحەت بکات، چونکە ئیسراحەت ئەوەیە کە مرۆڤ ماندووبێ ئەوجار ئیسراحەت بکات}، ئەو هەموو کەونو کائیناتەش بەڕێوەبەرێ لە گەردیلەوە تا کەهەکەشان، بەڵکو لە گەردیلەش وردتر کە هەر خوای بەدیهێنەر بۆخۆی دەزانێ، چونکە گەردیلەش لە چەند پێکهاتەیەکی وردتر پێکدێت، پرسیارێك دروست دەبێ: باشە ئایا خوای بێهاوەڵ ماندوو نابێ؟ بۆیە دەفەرموێ: ﴿وَلَا يَـُٔودُهُۥ حِفْظُهُمَا﴾، پاراستنی خواو پارێزگاریی لێکردنی خوا بۆ ئاسمانەکانو زەویو ئەوەی دەکەوێتە نێوانیان، خوا ماندوو ناکات بۆچی؟ چونکە دەستەڵاتی خوا بێسنوورە، کێ ماندوو دەبێ ؟! ئەوەی دەسەڵاتی سنووردارە، کە لەتوانای خۆی زیاتر بوو ماندوو دەبێ، بەڵکو پەکی دەکەوێ، بەڵام دەسەڵاتی خوا بێسنوورەو سنوورێکی نیە، بۆیە خوا بە هیچ شتێك ماندوو نابێو هەموو شتێکی پێ دەکرێ ﴿وَهُوَ ٱلْعَلِيُّ ٱلْعَظِيمُ﴾، وە خوا هەتا بڵێی بەرزەو هەتا بڵێی مەزنە، بەرزییو مەزنییەك کە بۆ خوا شایستەیە.

ئنجا دێتە سەر باسێکی دیو دەفەرموێ: ﴿لَآ إِكْرَاهَ فِى ٱلدِّينِ﴾، زۆریی لێکردنو ناچارکردن لە دیندا نیە، دەگونجێ ئەم (لا)یە، (لا)ی (ناهیة)بێ، واتە: تۆبزییکردن لە دیندا مەکەنو بۆ وەرگرتنی دین تۆبزییو زۆریی لەکەس مەکەن، وە دەشگونجێ (لا)ی (نافیة) بێ، واتە: ئەسڵی دین نابێ تۆبزیی تێدا بکرێ، چونکە دین بە

قەناعەتو بە عەقڵ وەردەگیرێو بەزۆری ناتوانی کەسێك والێبکەی بڕوای بە شتێك نەبێ، بڕوای پێبێنێ، یان کەسێکی خۆشنەوێ، خۆشی بوێ، ﴿ قَد تَّبَيَّنَ ٱلرُّشۡدُ مِنَ ٱلۡغَيِّۚ ﴾، سروشتی ئیسلام پێویستی بە تۆبزیی کردن نیە، چونکە سەر ڕاستیی وگومڕایی لێك جیابوونەتەوە، ئیسلام هەمووی سەراستییەو هەرکەسێك عەقڵی هەبێو فیطرەتی ساغ بێ، بۆخۆی دەزانێو هەڵیدەبژێرێو پێویست ناکات زۆری لێبکەی ﴿ فَمَن يَكۡفُرۡ بِٱلطَّٰغُوتِ وَيُؤۡمِنۢ بِٱللَّهِ فَقَدِ ٱسۡتَمۡسَكَ بِٱلۡعُرۡوَةِ ٱلۡوُثۡقَىٰ ﴾، جا هەر کەسێك بێبڕوابێ بەرانبەر بە طاغووت، وە ئیمان بە خوا بێنێ، ئەوە مسۆگەر دەستی بە قوڵفەی هەرە قاییم گرتوە ﴿ لَا ٱنفِصَامَ لَهَاۗ ﴾، قەت پچڕانی بۆ نیە ﴿ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴾، خوا بیسەری زانایە، قسەکانتان دەبیستێ، کردەوەکانیشتان دەزانێ، بەڵکو نهێنی نێو دڵەکانیشتان دەزانێ، لە کۆتاییشدا دەفەرموێ: ﴿ ٱللَّهُ وَلِيُّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ﴾، خوا دۆستو پشتیوانو یارمەتیدەری ئەوانەیە، کە ئیمانیان هێناوە ﴿ يُخۡرِجُهُم مِّنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِۖ ﴾، لە تاریکاییەکان دەربازیان دەکات بەرەو ڕووناکیی ﴿ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ أَوۡلِيَآؤُهُمُ ٱلطَّٰغُوتُ ﴾، وە ئەوانەی بێبڕوان دۆستو پشتیوانەکانیان طاغووتەکانن ﴿ يُخۡرِجُونَهُم مِّنَ ٱلنُّورِ إِلَى ٱلظُّلُمَٰتِۗ ﴾، لە ڕووناکییەوە بەرەو تاریکاییەکانیان دەبەن ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِۖ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴾، ئا ئەوانە هاوەڵی ئاگرن بە هەمیشەیی لە ئاگری دۆزەخدا دەمێننەوە، یاخود خاوەنی ئاگرن، واتە: یان وەك ڕەفیق چۆن دوو ڕەفیق لە یەکدی جیانابنەوە، ئەوانەش ئاوا لە دۆزەخ جیانابنەوەو هەر لەگەڵیدان، بەڵام بێگومان خراپترین ڕەفیقە، یاخود وەك چۆن کەسێك خاوەنی شتێك بێت، خاوەنداریێتی بۆ ئەوشتە لاناچێو هەر خاوەنیەتیو، تازە ئەوشتە هی ئەوە، ئەوانیش بەهەمان شێوە خاوەنی دۆزەخنو هەمیشە لە دۆزەخدا دەمێننەوە، وەك چۆن کەسێك کە شتێکی هەیە، لە خاوەنداریێتی ئەو شتە ناشۆرێ!

# چەند مەسەلەیەكی گرنگ

**مەسەلەی یەكەم:** خوا ﷻ كە دەفەرموێ: ﴿تِلْكَ ٱلرُّسُلُ فَضَّلْنَا بَعْضَهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ﴾ ئا ئەو پێغەمبەرانە (علیهم الصلاة والسلام) كە بۆت باسكراون و ناویان هاتوە، ئەی موحەممەد! هەندێكیانمان بەسەر هەندێكیاندا هەڵبژاردوەو پلەو پایەی زیادەمان داوە بە هەندێكیان بەسەر هەندێكیاندا.

زانایان گوتوویانە: لێرەدا خوای بەرز دەفەرموێ: ئەو پێغەمبەرانەمان هەندێكیانمان بەسەر هەندێكیاندا هەڵبژاردوە، بەڵام لە كۆتایی سوورەتی (البقرة)دا دەفەرموێ: ﴿لَا نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِّن رُّسُلِهِۦ﴾، واتە: جیاوازیی ناكەین لە نێوان هیچ كامێك لە پێغەمبەران، جا ئایا ئەو دوو ئایەتە تێك ناگیرێن؟! لەوێ دەفەرموێ: جیاوازییان ناخەینە نێوان، لێرەش دەفەرموێ: هەندێكیانمان بەسەر هەندێكیاندا هەڵبژاردوە! لە وەڵامدا دەڵێین: نەخێر، چونكە جیاوازیی نەخستنە نێوانی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) واتە: لەرووی ئیمان پێ هێنانیانەوەیە، ئێمە وەك یەك ئیمان بە هەموویان دێنین، ئۆممەتی موحەممەد ﷺ ناچن بڵێن: موحەممەد ﷺ پێغەمبەری خۆمانە، ئیمانی پێ دێنین، بەڵام ئیمان بە مووسا ناهێنین، ئیمان بە عیسا ناهێنین، ئیمان بە داوود ناهێنین ئیمان بە پێغەمبەرانی دیكە (علیهم الصلاة والسلام) ناهێنن، بەڵكو وەك یەك ئیمان بەهەمووان دێنین، چونكە پێغەمبەران هەموویان كە هاتوون یەكدی بەڕاست دەزانن، ئەدی بەسەریەكدیدا هەڵبژاردنیان یانی چی؟ واتە: خوای مەزن هەندێ شتی داوە بە هەندێكیان، نەیداوە بە ئەوانی دیكە، هەرچەندە هەموویان پێغەمبەرن و هەموویان پایە بەرزن، وەك چۆن چیایەك هەموو لووتكەكانی بەرزن، بەڵام هەندێك لە لووتكەكانی لە هەندێكیان بەرزترن، هەموویان لووتكەن، بەڵام هەندێك لە لووتكەكانیش لە هەندێكیان بەرزترن، كەواتە: پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) بەرزو بەرزتریان لەنێودا هەیە،

نالێین بەرزیی‌و نزمیی ! هەموویان بەرزن، بەڵام بەرزو بەرزتریان لە نێوادا هەیە.

بەڵام ئەوەش لە حاڵێکدا کە ئەو بەرزیی‌و بەرزتر بوونە:

**یەکەم**: لەسەر بناغەی گومان نەبێ، بەڵکو لەسەر بناغەی دەقێکی شەرعیی بێ.

**دووەم**: بۆ دەمارگیریی (تَعَصُّبْ) نەبێ.

**سێیەم**: کەمیی پاڵ نەدرێتە لای هیچ کام لە پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام)، بۆ وێنە: ئێمەی مسوڵمان مەدحی موحەممەدﷺ بکەین، بەڵام لەولاوە زەمی پێغەمبەرێکی دیکە بکەین‌و نوقصانیی بدەینە پاڵ، ئا ئەوە گوناهەو لادانە.

ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەریش ﷺ دەبێ ئاوا لێی حاڵی بین، کە فەرموویەتی: {(لاَ تُفَضِّلُوا بَيْنَ الأَنْبِيَاء) (رَوَاهُ البُخَارِيُّ برقم: (٣٤١٤)، وَمسلم برقم: (٦١٠٢)}، واتە: هەڵبژاردن مەکەن لەنێوان پێغەمبەراندا بەرزیی‌و بەرزتریان مەخەنە نێوان، واتە: لەڕووی دەمارگیرییەوە ئەوە مەکەن، کە لەگەڵ جوولەکەکان‌و نەصرانیی یەکان قسە دەکەن، مەڵێن پێغەمبەری ئێمە وایەو هی ئێوە وانیە، چونکە ئەوە دەمارگیرییە.

هەروەها لە فەرمایشتێکی دیکەدا فەرموویەتی: {(لاَ تُخَيِّرُوا بَيْنَ الأَنْبِيَاءِ) (رَوَاهُ البُخَارِيُّ برقم: (٢٤١٢)، وَمسلم برقم: (٦١٠٦)، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه}، واتە: پێغەمبەران هەندێکیان بەسەر هەندێکیان هەڵمەبژێرن، مەبەست پێی چییە؟ دیارە یان مەبەست پێی ئەوەیە: لەڕووی گومان‌و وەهمەوە ئەوە مەکەن، یان مەبەست ئەوەیە کە لەڕووی دەمارگیرییەوە ئەوە مەکەن، وە یان مەبەستی ئەوە بووە کە لەڕووی بەکەم تەماشاکردنی پێغەمبەرانی دیکەوە، ئەوە مەکەن، بۆچی ؟ چونکە ئەوە دیارە خوا بۆخۆی دەفەرموێ: هەندێکیانمان بەسەر هەندێکیاندا هەڵبژاردوە ﴿وَرَفَعَ بَعْضَهُمْ دَرَجَٰتٍ﴾، هەندێکیانی بە چەند پلە

بەسەر ئەوانی دیکەدا بەرزکردۆتەوە، پاشان پێغەمبەر ﷺ بۆخۆشی فەرموویەتی: {(أَنَا سَيِّدُ وَلَدِ آدَمَ) (رَوَاهُ مسلم برقم: (٥٨٩٩)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٣٦١٥)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٦٤٦٥)، عَنْ أبي هُرَيرَةَ رضي الله عنه}، واتە: من گەورەی ڕۆڵەکانی ئادەمم، سەروەری ڕۆڵەو وەچەی ئادەمم، کەواتە: دیارە مەبەست لەو فەرمایشتانەی دیکە ئەو مەبەستانەیە کە گوتمان.

**مەسەلەی دووەم:** کە دەفەرموێ: ﴿مِّنْهُم مَّن كَلَّمَ ٱللَّهُ وَرَفَعَ بَعْضَهُمْ دَرَجَٰتٍ﴾، کە دەفەرموێ: ﴿مِّنْهُم مَّن كَلَّمَ ٱللَّهُ﴾، بە تەئکید مەبەستی پێ مووسایە، وەك لە جێیەکی دیکە دەفەرموێ: ﴿وَكَلَّمَ ٱللَّهُ مُوسَىٰ تَكْلِيمًا ﴿١٦٤﴾﴾ النساء، واتە: خوا ﷻ بە دواندن مووسای دواندو قسەی لەگەڵدا کرد، وە مەبەست لە: ﴿وَرَفَعَ بَعْضَهُمْ دَرَجَٰتٍ﴾، هەرکام لە: ئیبراهیمو موحەممەدن (عليهما الصلاة والسلام) هەرچەندە ناوی نەهێناون، چونکە هەرکامیان وەك لە گەلێك دەقی قورئانو سوننەتەوە دیارە، بەچەند پلە لە سەرووی پێغەمبەرانی دیکەوەن.

**مەسەلەی سێیەم:** ئایا (روح القدس) کێیە؟ خوای بەرزو بێوێنە بۆی ڕوون کردووینەتەوە، وەك لە سوورەتی (النحل)دا دەفەرموێ: ﴿قُلْ نَزَّلَهُۥ رُوحُ ٱلْقُدُسِ مِن رَّبِّكَ بِٱلْحَقِّ ...﴿١٠٢﴾﴾، واتە: بڵێ (روح القدس) لە پەروەردگارتەوە بە هەق قورئانی دابەزاندۆتە سەر تۆ، کەواتە: (روح القدس) واتە: (جبريل) عليه السلام، بۆیەش ئەو ناوەی لێنراوە، چونکە (جبريل) وەحییەكو پەیامێك لە خواوە دێنێ، کە دەبێتە هۆی پاککردنەوەی عەقڵی خەڵك لە ئەفسانەو بیروبۆچوونی هەڵە، وە دڵو دەروونی خەڵك لە هەواو ئارەزوو، وە ڕەفتاری خەڵك لە عادەتو نەریتی نەفامیی، وە ژیانو گوزەرانی خەڵك لە ستەمو بێدادیی خاوێن دەکاتەوە، وە عەقڵو دڵو مێشكو ژیانو ڕەفتارو ئاکاری خەڵك، بەهەموو ئەو شتانەی کە لای خوا پەسندو چاکن، دەڕازێنێتەوەو جوان دەکات.

**مەسەلەی چوارەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ مَا ٱقْتَتَلَ ٱلَّذِينَ مِنۢ بَعْدِهِم مِّنۢ بَعْدِ مَا جَآءَتْهُمُ ٱلْبَيِّنَٰتُ ﴾، وە ئەگەر خوا ویستبای ئەوانەی دوای پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) دوای ئەوەی بەڵگە ئاشکراکانیان بۆ هاتن، کوشتاریان نەدەکردو لەنێوان خۆیاندا بەشەڕ نەدەهاتن، لێرەدا مەبەست لە (شاء الله) مەشیئەتی جەبر لێکردن‌و تۆبزیی لێکردنە، واتە: خوای باڵادەست نەیویستوە زۆریان لێبکات، ئەگەرنا کە کوشتارو شەڕیشیان کردوە هەر بە ویستی خوا شەڕیان بووە، بەڵام مەبەستی ئەوەیە: کە ئەگەر ویستبام زۆریان لێبکەم‌و تۆبزییان لێبکەم، نەمدەهێشت بەشەڕ بێن، قەت بیستووتانە دوو فریشتە بەیەکەوە بەشەڕ بێن ؟ نەخێر، چونکە خوای پەروەردگار نەیویستوەو ڕێی لێ‌گرتوون، بەڵام خوا نەیویستوە ڕێ لە ئینسانەکان بگرێ، بەڵکو ویستوویەتی ئازادیان بکات‌و دەستیان بکاتەوە بۆ خێرو بۆ شەڕ، ئنجا ئایا هۆکاری بەشەڕهاتنەکەیان چییە؟ دەفەرموێ: ﴿ وَلَٰكِنِ ٱخْتَلَفُوا۟ فَمِنْهُم مَّنْ ءَامَنَ وَمِنْهُم مَّن كَفَرَ ﴾، هەمیشە شەڕو کوشتار لە ناکۆکیی فیکریی‌و سیاسیی‌و کۆمەڵایەتیی‌و ئابووریی‌یەوە پەیدادەبێ، کە ناکۆکیی‌و مشت‌ومڕو دووبەرەکیی هەبوو، ئنجا سەنگەر لەیەکدی دەگیرێ، هەڵبەتە دەشگونجێ ناکۆکیی فیکریی‌و سیاسیی، بە دیالۆگ‌و بە وتوویێژ چارەسەر بکرێ، وەك هەمیشە پێغەمبەران وایانکردوەو بانگی نەیارەکانیان کردوە بۆ وتوویێژ وەك خوای پەنهانزان فەرموویەتی: ﴿ ... قُلْ هَاتُوا۟ بُرْهَٰنَكُمْ ...﴿٦٤﴾ ﴾ النمل، بڵێ: بەڵگەتان بێنن، بەڵام ئیدی خەڵکی نەفام‌و نەزان، یان ئەوانەی چاویان لە ملهوڕییە، لەجیاتی ئەوەی پشت بە بەڵگە ببەستن، پشتیان بەهێز بەستوەو سەرەنجام ئەو دەرهاویشتە خراپەی لێ پەیدابووە، واتە: لەجیاتی ئەوەی کە هێزی لۆژیك (قوة المَنطق) بەکاربێنن لۆژیکی هێز (مَنْطق القوة)یان بەکارهێناوەو سەرەنجام کوشتارو زەبرو زەنگ ڕوویداوە.

**مەسەلەی پێنجەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يَفۡعَلُ مَا يُرِيدُ ﴾، بەڵام خوا ئەوە دەکات کە دەیەوێ، ئایا ئەمە چی لێوەردەگیرێ؟ ئایا کاری خوا ﷻ هەڕەمەکییە؟ چونکە ئێمەی ئینسان ئەگەر بێو ئاگامان لە خۆمان نەبێو سیفەتەکانی خوا قیاس بکەینە سەر سیفەتەکانی خۆمان، ئەوە بەهەڵە لە هەندێك تەعبیری قورئان حاڵی دەبین، چونکە ئەگەر کەسێك بڵێ: چۆنم کەیف لێبێ وادەکەمو، بۆخۆم چۆنم پێخۆشە وادەکەم، دەزانین ئەگەر کەسێك وابڵێ، مەبەستی ئەوەیە زوڵم دەکا، عەدل دەکا، چاکە دەکا، خراپە دەکا، بە کەیفی خۆیەتی !

بەڵام خوای بێوێنە کە دەفەرموێ: ﴿ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يَفۡعَلُ مَا يُرِيدُ ﴾، خوا هەرچی بیەوێ وا دەکا، مەبەستێکی تایبەتی هەیە، ئایا خوای پەروەردگار چی دەوێ؟ بێگومان ئەوەی دەوێ کە عیلمی خوای زانا دەیخوازێو، ئەوەی دەوێ کە حیکمەتی خوای کاربەجێ دەیخوازێ، چونکە توانای خوای باڵادەست شوێن ویستی دەکەوێو، ویستی خوا شوێن عیلمو حیکمەتی خوای بێهاوتا دەکەوێ، کەواتە: خوا ﷻ چی دەکات؟ بێگومان بەس ئەوە دەکات کە حیکمەتەکەیو زانیارییەکەیو کەرەمو بەزەییەکەی دەیخوازێو، ئەمەش مانای وایە لەمیانی یاساکانیداو لەمیانی جاریبوونی حیکمەتو عیلمی بێسنووریدا، خوای بێوێنە ویستی خۆیو هێزی خۆی بەکاردێنێو کارەکانی ئەنجام دەدا.

**مەسەلەی شەشەم:**

**توێژینەوەیەك دەربارەی (آية الكرسي):**

یەکەم: پلەو پایەی ئەم ئایەتە:

ئەم ئایەتە گەورەترین ئایەتە لە قورئانداو لەوبارەوە چەند فەرموودەیەك هەن بۆ نموونە:

١/ {(عَنْ أُبَي بن كَعْب رضي الله عنه أَنَّ النَّبِيّ ﷺ سَأَلَهُ أيُّ آيةٍ مِنْ كِتَابِ اللهِ أعْظَم ؟ قَالَ: آيةَ الكُرسي، قَالَ: لِيَهْنِكَ العِلْمُ أَبَا المُنْذِرِ) (رَوَاهُ مسلم برقم:

(١٨٨٢)، وَأَبُو دَاوُدَ بِرقم: (١٤٦٠)}، واتە: ئوبەی کوڕی کەعب کە یەکێکە لە هاوەڵانی بەڕێز، پێغەمبەری خوا ﷺ پرسیاری لێکرد: چ ئایەتێک لە کتێبی خوادا ﷻ لە هەموو ئایەتەکان گەورەترە ؟! گوتی: (آية الكرسي)، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بە زانیاری خۆت دڵخۆشبە ئەی (أبا المُنذر) {دیارە ئەوە کونیەی ئوبەی کوڕی کەعبە}، واتە: تۆ زانیارییەکی باشت هەیە، مادام دەزانی کە کام ئایەت لە هەموو ئایەتەکان گەورەترە.

٢/ هەروەها لە فەرمایشتێکی دیکەدا پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {(سُورَةَ البَقَرَةَ فِيهَا آية هِيَ سيدة آي القُرآن، لاَ تُقْرَأُ في بَيْتٍ وفِيهِ شَيْطَان إلاَّ خَرَجَ مِنهُ: آية الكُرْسِيِّ) (أَخْرَجَهُ ابْنُ مَنْصُور وَالحَاكِمُ برقم: (٢٠٥٩) وَصَحَّحَهُ، وَالبَيْهَقِي في (شُعب الإيمان) برقم: (٢٣٨٩)، عَنْ أبي هُرَيرَةَ رضي الله عنه}، واتە: سوورەتی بەقەرە ئایەتێکی تێدایە گەورەی ئایەتەکانی قورئانە، لە هیچ ماڵێکدا ناخوێنرێتەوە کە شەیتانی تێدابێ مەگەر شەیتان یەکسەر دەچێتە دەر، ئەویش بریتیە لە (آية الكرسي).

٣/ هەروەها لە (صحيح)ی بوخارییدا هاتوە، کە ئەبوو هورەیرە بەسەرهاتێک دەگێڕێتەوە ئاوا دەست پێدەکات {وَكَّلَنِي رَسُولَ اللهِ ﷺ بِحِفظِ زَكَاةِ رَمَضَانَ، فَأَتَانِي آتٍ، فَجَعَلَ يَحثُومِنَ الطَّعام، فَأَخذْتُهُ وقُلْتُ: واللهِ لأَرْفَعَنَّكَ إلى رَسُولِ الله ﷺ، قَالَ: إنِّي مُحتَاجٌ وَعَلَيَّ عِيَالٌ ولي حاجةٌ شديدةٌ، قَالَ: فَخَلَّيتُ عَنهُ، فأصبَحتُ فقالَ النَّبيُّ ﷺ (يا أبَا هُرَيرَةَ ما فَعَلَ أسيرُكَ البارِحة؟)، قَالَ: قُلْتُ: يارَسول اللهِ ﷺ، شَكا حَاجَةً شَديدَةً، وَعيالاً، فَرَحِمْتُهُ فَخَلَّيتُ سبيلَهُ، قَالَ: (أمَا إنَّهُ كَذَبَكَ، وَسَيَعُود)، فَعَرفتُ أنَّهُ سَيَعُودُ، لِقَولِ رَسُولِ اللهِ ﷺ: (إنَّهُ سَيَعُودُ)}، واتە: ئەبو هورەیرە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ پارێزگارییکردنی زەکاتی ڕەمەزانی بەمن سپاردبوو، کەسێك هات لە خۆراکی زەکات بە چەنگ چەنگی لێدەدا لە کۆشی خۆی، یان لە شتێکی دەکرد، منیش گرتم و گوتم: دەتدەمە دەست پێغەمبەری خوا !، ئەویش گوتی: من ئاتاجم و

منـدالّی وردم هـەن‌و زۆرم پێویستی هەیـە، دەڵێ: منیش وازم لێهـێنا، بـەیانی پێغەمبـەر ﷺ فـەرمووی: ئـەی ئـەبو هـوڕەیرە دیلەکـەی دوێنـێ شـەوت چـی کـرد؟ منـیش گـوتم: ئـەی پێغەمبـەری خـوا سـکالآی کـرد کـە زۆر ئاتاجـەو منداڵیشی وردن، منیش بەزەییم پێداهاتەوەو بەرمـدا، فـەرمووی: ئاگـاداربـە درۆی لەگەڵ کـردووی‌و دێتەوەش ! منیـش زانیم کە هەر دێتەوە لەبەر قسەی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: دێتـەوە ! جـا دیـارە هەتـا سـێ شـەوان ئـەوە دووبارە بۆتەوە، شەوی سێیەم ئەبو هوڕەیرە دەڵێ: {خلِّني أُعَلِّمْكَ كَلِمَاتٍ يَنْفَعُكَ اللهُ بِهَا، قُلْتُ مَا هُوَ؟ قَالَ: إذا أَوَيْتَ إِلَى فِرَاشِكَ، فاقْرَأْ آيَةَ الكُرْسِيِّ ﴿ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ﴾، حتَّى تَخْتِمَ الآيَةَ، فإِنَّكَ لَنْ يَزَالَ عَلَيْكَ مِنَ اللهِ حَافِظٌ، وَلاَ يَقْرَبَنَّكَ شَيطَانٌ حَتَّى تُصْبِحَ، فَأَخبر أبو هريرة بِذَلِكَ رَسُولَ الله ﷺ قَالَ: (أمَا إِنَّهُ قَدْ صَدَقَكَ وَهُوَ كَذُوبٌ تَعْلَمُ مَنْ تُخَاطِبُ مِنذُ ثَلاَثِ لَيَالٍ يَا أَبَا هُرَيرَةَ ؟) قَالَ: لاَ، قَالَ: (ذَاكَ شَيْطَانٌ) (رَوَاهُ البُخاري برقم: (٢٣١١)}، واتە: بەرمدە چەند وشـەیەکت فێر دەکەم کە خـوا بیانکاتە مایەی سوود لـێ ببینـینت، گـوتم: چییـە؟ گـوتی: هـەر کاتێك شـەو چوویە سەر جێگا، (آية الكرسي) بخوێنـە، چونکە هـەتا ڕۆژ دەکەیـەوە، خـوا پارێزەرێکت بۆ دادەنێ‌و شەیتان توخنت ناکەوێ، ئـەبو هوڕەیرەش ئـەوەی بـۆ پێغەمبـەر ﷺ گێڕایـەوە، پێغەمبـەریش ﷺ فەرمـووی: ئاگـاداربە ڕاسـتی لەگـەڵ کـردووی، بـەڵام زۆر درۆزنیـشـە، {واتـە: تەنیـا لـەوەدا ڕاستی لەگـەڵ کردووی}، وە فەرمووی: دەزانـی کـێ بـوو قسـەت لەگـەڵدا دەکـرد ئـەی ئـەبو هوڕەیرە ! ئەو سێ شەوە؟ گوتی: نەخێر، فـەرمووی: ئەوە شـەیتـان بوو.

دووەم: نێـوەڕۆك‌و مەبەسـتەکـانی (آيـة الكـرسي):

(آية الكرسي) لە دە ڕستە پێکهاتوە، هەرکـام لـەو ڕسـتانە وەسفێکی خـوای پەروەردگـار یـان پێناسـەیەکی خـوای تێدایــەو، بـە هـەموویان خـوا وەسـف‌و پێناسـە دەکـەن، بـە شـێوەیەك کـە زۆر ڕوون بـێ‌و هـیچ ئایەتێـك نیـە لـە

قورئاندا بەقەدەر ئەم ئایەتە وەسفو پێناسەی خوای بەرزو مەزنی تێدابێ، بۆیەش گەورەترین ئایەتە، ئەمەش دە ڕستەکانن:

❋ **ڕستەی یەکەم/** ﴿ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ﴾، خوا، جگە لەو هیچ پەرستراوێك نیە، ئەمە یەکەم پێناسەی خوایە ﷻ، خوا (ٱللَّهُ): ناوی (عَلَم)ی خوایە، بۆیە (تَثْنِیة) ناکرێو کۆش ناکرێتەوە، جا لە زمانی کوردیدا هەندێ لە نووسەرانو هەندێ مەلاکانیش دەڵێن: (خوایەکان) کە ئەوە غەڵەتە، چونکە خوا ئەگەر تەرجەمەی وشەی: (ٱللَّهُ)بێ، کۆ ناکرێتەوە، بەڵام وشەی: (إلَـه) (تَثْنِیة) دەکرێ، وە کۆش دەکرێتەوە: (إلـهان)، (إلهیـن) (آلِهَـة) چونکە پەرستراو (إلَـه) دەگونجێ جۆراو جۆربێ، بەڵام خوا (ٱللَّهُ) یەکێکە، ئەو زاتەی کەونو کائیناتی دروست کردوە یەکێکە، بۆیەش (تَثْنِیة) ناکرێو وە کۆش ناکرێتەوە، بەڵام ئەو شتانەی کە خەڵك دەیانپەرستن، دەگونجێ جۆراو جۆربن، یەکێ هەواو ئارەزوو دەپەرستێ، یەکێ حیزبێك دەپەرستێ، یەکێ فیرعەون دەپەرستێ، یەکێ شەیتان دەپەرستێ، یەکێ دارو بەرد دەپەرستێ، یەکێ مانگو خۆر دەپەرستێ، ﴿ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ﴾، جگە لەو هیچ پەرستراو نین، واتە: پەرستراوی بەهەق ئەگەرنا پەرستراوی بەناهەق زۆرن، پەرستراوێك کە شایستەی پەرستن بێ یەکە، ئەویش خوایە.

❋ **ڕستەی دووەم/** ﴿ ٱلْحَىُّ ٱلْقَيُّومُ ﴾، زیندووی مشوورگێڕە، بۆخۆی خاوەنی ژیانە، ژیانێك کە سەرەتای نیە، کۆتایشی نیە وە بۆ غەیری خۆیشی مشوورگێڕو سەرپەرشتیارە.

❋ **ڕستەی سێیەم/** ﴿ لَا تَأْخُذُهُۥ سِنَةٌ وَلَا نَوْمٌ ﴾، نە وەنەوز دەیگرێو نە خەوی لێدەکەوێ، جا ئەگەر وا نەبێت چۆن سەرپەرشتیاری کەونو کائیناتی پێدەکرێ، لە تەفسیرەکاندا هاتوە، لە مووسا عليه السلام دەگێڕرێتەوە، بەڵام من

ئەوە بەدوور[1] دەزانم و ڕەنگە یەکێك لە پیاوچاکان بووبێ، گومانێکی بۆدێ: جا تۆ بڵێی پەروەردگار خەوی نەبێ و ئیسراحەتێك نەکات؟! دەڵێ دوو فریشتە لە شێوەی دوو ئینساندا دەچن بۆلای و دوو شووشەی وێدەدەن، دەڵێن ئەو دوو شووشانەمان بۆ بگرەو دایانمەنێ، با هەر بەدەستتەوە بن، ئنجا دەشی خافڵێنن، دەبێتە دوو شەوو دوو ڕۆژ نایەڵن بنوێ، دەیخافڵێنن و دەڵێن نابێ شووشەکانیش دابنێی و سەرەنجام وەنەوز دەیگرێ و شووشەکان پێکدا دەدات، پێی دەڵێن: دوو شووشە بە دەستی تۆوە بوون، لەحزەیەك لێیان غافڵ بووی و وەنەوزت هاتێ شکاندتن، ئەدی ئەو کەون و کائیناتە ئەگەر خوای پەروەردگار لێی غافڵ بێ چۆن بەڕێوەدەچێ ؟

بۆیە خوای مشوورگێڕ دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ خَلَقْنَا فَوْقَكُمْ سَبْعَ طَرَآئِقَ وَمَا كُنَّا عَنِ ٱلْخَلْقِ غَٰفِلِينَ ﴿١٧﴾ ﴾ المؤمنون، واتە: وە لە سەرووی ئێوەوە حەوت ئاسمانی چین لەدوای چینمان دروستکردوون، وە ئێمە لە دروستکراوەکانی خۆمان بێئاگا نین، بەڵێ ناگونجێ خوای بەدیهێنەر بێئاگابێ لە دروستکراوەکانی خۆی، چونکە بێئاگابوون نوقصانییە، وە خواش لە هەموو نوقصانییەك دوورەو، هەموو سیفەتێکی باشی هەیە.

❋ **ڕستەی چوارەم/** ﴿ لَّهُۥ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ ﴾، هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە هی خوایەو، هیچ کەسێك نیە خاوەنی هیچ شتێك بێ، بەڵکو خۆشیو ئەوەی هەشیەتی موڵکی خوایە ﷻ، هەرچەند جاری وا هەیە هەندێك لە بەندەکان لەخۆبایی دەبن و یاخی دەبن، وەك فیرعەون کە دەیگوت: ﴿ أَلَيْسَ لِى مُلْكُ مِصْرَ وَهَٰذِهِ ٱلْأَنْهَٰرُ تَجْرِى مِن تَحْتِىٓ أَفَلَا تُبْصِرُونَ ﴿٥١﴾ ﴾ الزخرف، واتە: ئایا موڵکی میسر هی من نیە، ئەو

---

١) ضَعيف جداً، أَخرَجَهُ أَبو يعلى، برقم: (٦٦٦٩) والديلمي في الفردوس برقم: (٧١٢٦)، وابن الجوزي في الواهيات (٢٢ - ٢٣) من حديث أبو هريرة، وقالَ ابن الجوزي: ولا يثبت هذا الحديث عَن رسول الله ﷺ وغَلَط من رفعه، تفسير القرطبي، بتحقيق عبدالرزاق المهدي.

ڕووبارانەش بە ژێر کۆشکەکەمدا دەڕۆن، ئایا نابینن، بەڵام فیرعەون چی لێهات ؟ خوای تۆڵەستێن دەفەرموێ: ﴿ فَالْيَوْمَ نُنَجِّيكَ بِبَدَنِكَ لِتَكُونَ لِمَنْ خَلْفَكَ آيَةً ﴿٩٢﴾ ﴾، واتە: ئەمڕۆ جەستەکەت ڕزگار دەکەین بۆ ئەوەی بۆ دوای خۆت ببێ بە نیشانە، دیارە بەڵێی خوای پەروەردگار هاتۆتە دی‌و، ئێستا جەستەکەی لە مۆزەخانەی میسرە، هەڵبەتە فیرعەونی مووسا، چونکە فیرعەون ناوی هەموو ئەو پادشایانە بوو، کە لە میسر حوکمیان کردوە، بەڵام فیرعەونی مووسا ناوی (خۆفو) بووەو، ئێستا لاشەکەی لە میسر دانراوەو بۆتە موڵکی مۆزەخانە !

* **ڕستەی پێنجەم/** ﴿ مَن ذَا الَّذِي يَشْفَعُ عِندَهُ إِلَّا بِإِذْنِهِ ﴾، کێ هەیە تکا بکات لەلای خوا، مەگەر بە مۆڵەتی خوا، نەك هەر هیچ کەس خاوەنی هیچ شتێك نیە، هیچ کەس تەنانەت توانای تکاکردنیشی نیە لەلای خوا، جاری وایە کابرا بۆخۆی دەسەڵاتی نیە، بەڵام دەتوانێ تکابکات لەلای دەستەڵاتدارێك، بۆخۆی شتێکی نیە، بەڵام دەتوانێ داوا بکات لە کەسێك کە هەیەتی، بەڵام خوای باڵادەست دەفەرموێ: هیچ کەس توانای تکا کردن‌و داواکردنیشی لە خوا نیە، مەگەر خوای بە بەزەیی بۆخۆی مۆڵەتی پێبدا.

* **ڕستەی شەشەم/** ﴿ يَعْلَمُ مَا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ ﴾، دیارە ئەو شتانە هەموویان تایبەتن بە خواوەو کەسی دیکە نیە ئاوابێ، کەس نیە هەر خۆی پەرستراو بێ‌و جگە لەو هیچ پەرستراوی بەهەق نەبن، وە کەسی دیکە نیە خاوەنی ژیانی بێ، سەرەتاو بێ کۆتایی بێ، وە کەسێکی دی نیە کە وەنەوز نەیگرێ‌و خەوی لێ نەکەوێ، وە کەسێکی دیکە نیە خاوەنی ئاسمانەکان‌و زەوی بێ‌و، هیچ کەس نەتوانێ هیچ تکایەك بۆ کەس بکات مەگەر بۆخۆی مۆڵەت بدات، ئنجا ﴿ يَعْلَمُ مَا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ ﴾، هەرچی لە پێشیانەوەیەو هەرچی لە دوایانەوەیە، هەمووی دەزانێ، واتە: داهاتوو هەمووی دەزانێ تا کۆتایی، وە ڕابردووش هەمووی دەزانێ، ئایا کێ هەیە

هەموو ڕابردوو بزانێ، وە داهاتووش هەمووی بزانێ؟ دەگونجێ مرۆڤ شتێك لە ڕابردوو بزانێ، بەڵام تێکەڵ بە جەهلێکی زۆر، وە دەگونجێ بۆ داهاتوو هەندێ پێشبینی بکات، بەڵام بە هەڵەی زۆرەوە، بەڵام تەنیا خوای زاناو شارەزا زانیاری تەواوی هەیە، بە ڕابردووو داهاتوو.

*ڕستەی حەوتەم/ ﴿ وَلَا يُحِيطُونَ بِشَيْءٍ مِّنْ عِلْمِهِۦٓ إِلَّا بِمَا شَآءَ ﴾، ئینسانەکان یان دروستکراوەکان هیچ شتێ لە زانیاری خوا نازانن، مەگەر ئەوەی خۆی بیەوێ، ئەو هەموو شتێك دەزانێ، بەڵام دروستکراوەکان هیچ شتێك لەو زانیارییەی خوای پەروەردگار پەی پێ نابەن، مەگەر ئەوەی بۆخۆی ئیزنی لەسەربێ، کەواتە: ئینسان هەرچی بیزانێ هەر بە ئیزنی خوایەو، هەر لەو سنوورە دایە کە خوا مۆڵەتی داوەو، خوای بەرزو مەزن بە پێویستی زانیوە بیزانێو ژیانی پێ بەرێوە بچێ.

*ڕستەی هەشتەم/ ﴿ وَسِعَ كُرْسِيُّهُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ ﴾، کورسی خوا ئاسمانەکانو زەوی گرتۆتەوە، وەك پێشتر گوتمان کورسی بە مانای زانیاریو بە مانای دەسەڵاتو بە مانای حوکمڕانیی دێ، وە هەندێکیش گوتوویانە: کورسی جیسمێکەو دروستکراوێکی خوای بێوێنەیە، ئەوە بوو کە لە فەرموودەکەدا هێنام، کە دەڵێ: ئاڵقەیەك کە لە بیابانێکدا فڕێ دەدرێ، لەچاو بیابانەکە چەندە، ئاسمانەکانو زەوییش لەچاو کورسی خوای بێهاوتا ئەوەندەن، بەڵام مانای ڕاست ئەوەیە کە کورسی بە مانای زانیارییە، یاخود بە مانای دەسەڵاتو حوکمڕانییە.

* ڕستەی نۆیەم/ ﴿ وَلَا يَـُٔودُهُۥ حِفْظُهُمَا ﴾، پارێزگاریی لێکردنی خوا ﷻ بۆ ئاسمانەکانو زەوی، خوا ماندوو ناکات ﴿ وَلَا يَـُٔودُهُۥ ﴾ واتە: (وَلاَ يُتْعِبُهُ) ماندووی ناکات، ئنجا ئایا بۆچی ماندوو نابێ؟ چونکە توانای خوای توانادار بێسنوورەو، کە توانای خواش بێسنوور بوو، مانای وایە ماندوو نابێ، کێ ماندوو دەبێ؟ ئەو کەسەی کە تواناکەی سنووردارە.

❁ **ڕستەی دەیەم/** ﴿ وَهُوَ ٱلۡعَلِيُّ ٱلۡعَظِيمُ ﴾، وە ئەو هەتا بڵێی بەرزەو هەتا بڵێی مەزنە، بەرزیی‌و مەزنییەك كە بۆ خوا شایستەن‌و، بە هەموو واتاكانی بەرزیی‌و مەزنیی كە بۆ خوا شایستەن، خوا بەرزو مەزنە.

**مەسەلەی حەوتەم:** ئەو ڕستەیەی كە دەفەرمویْ: ﴿ لَآ إِكۡرَاهَ فِي ٱلدِّينِۖ ﴾، كە پێشتر هۆی هاتنە خوارەوەكەیمان باسكردو ئەوە بوو كە هەندێ لە خەڵكی مەدینە پێش ئەوەی مسوڵمان بن، نەزریان كردبوو ئەگەر كوڕیان بووو ژیا، كوڕەكەیان بكەنە جوولەكە یان بیكەنە نەصرانیی، جا دوای ئەوەی جوولەكەكان وەدەرنران، بابو دایكی ئەو منداڵانە چونە لای پێغەمبەرﷺو گوتیان: ئایا كوڕەكانمان بە تۆبزیی بێنینەوە نێو ئیسلام ؟! خوای دادگەریش ئەم ئایەتەی نارده خوار، كە تۆبزییكردن ناچاركردن لە دیندا نیە، جا ئایا لێرەدا ئەم (لا)یە (نافیة)یە، یان (ناهیة)؟ ئەگەر (نافیة)بێ، واتە: سروشتی دین تۆبزییكردن هەڵناگرێ، ئایا دەگونجێ كەسێك بە تۆبزیی والێبكەی خوای بێوێنەی خۆش بوێ ؟ نەخێر، كەواتە: ئینسان هەرگیز بە تۆبزیی ناكرێ بە مسوڵمان، بەڵكو ئەوپەڕی دەبێتە موناڤیق، ئەگەر (لا)یەكە (ناهیة)یە بێ، واتە: تۆبزیی مەكەن لە خەڵك كە بەزۆر پابەندیان بكەن بە ئیسلامەوەو بە زۆر بیانكەنە مسوڵمان، چونكە كە زۆرت لێكرد، نایكەیە مسوڵمان، بەڵكو دەیكەیە موناڤیق، دیارە هەندێك لە زانایان گوتوویانە: ﴿ لَآ إِكۡرَاهَ فِي ٱلدِّينِۖ ﴾، (مَنْسُوخ)ەو نەسخ كراوەتەوە، بەڵام من لە دەرسەكانی ڕابردوودا گوتوومە: كە هیچ ئایەتێك‌و هیچ ڕستەیەك لە قورئاندا (مَنْسُوخ) نیە، بەڵكو ئایەتێك باسی مەسەلەیەك دەكات بەگشتی‌و، ئایەتێكی دیكە دێنێ بە شێوەیەكی تایبەت باسی دەكات، بۆ وێنە پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ ...وَلَا تُمۡسِكُواْ بِعِصَمِ ٱلۡكَوَافِرِ ...⁽١٠⁾ ﴾ الممتحنة، واتە: ئافرەتانی كافر لەژێر نیكاحی خۆتاندا مەهێڵنەوە، وە ئایەتێكی دیكەمان هەیە دەفەرموێ: ﴿ ٱلۡيَوۡمَ أُحِلَّ لَكُمُ ٱلطَّيِّبَٰتُۖ وَطَعَامُ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ حِلّٞ لَّكُمۡ وَطَعَامُكُمۡ حِلّٞ لَّهُمۡۖ وَٱلۡمُحۡصَنَٰتُ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنَٰتِ وَٱلۡمُحۡصَنَٰتُ مِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ

مِن قَبۡلِكُمۡ ...﴿٥﴾ ﴾ المائدة، واتە: ئەمڕۆ خواردنە پاك‌و چاكەكانتان بۆ حەڵاڵ كراون، وە خواردنی ئەوانەی كتێبیان پێدراوە بۆتان حەڵاڵە، وە خواردنی ئێوەش بۆوان حەڵاڵە، وە ئافرەتانی پاكی بڕوادار، وە ئافرەتانی پاك لەوانەی پێش ئێوە كتێبیان دراوەتێ، كەواتە: ئافرەتانی پاكداوێنی خاوەن كتێبەكان بۆ مسوڵمانان حەڵاڵن، كە هاوسەرگیریی‌یان لەگەڵ بكرێ، لەوێش دەفەرمووێ: ئافرەتانی كافر لەژێر نیكاحی خۆتاندا مەهێڵنەوە، واتە: ئەگەر خێزانیشی بێ دەبێ تەڵاقی بدا، دیارە ئایەتەكەی سووڕەتی (الممتحنة) گشتییەو ئایەتەكەی سووڕەتی (المائدة) ئەو مانا گشتییەی تایبەت كردوە، وە لە قورئاندا ئەوە زۆرە، كە شتی گشتی (عام) تایبەت دەكرێ‌و، شتی ڕەها (مطلق) بەنددار (مقیّد) دەكرێ‌و شتی كورت (مُجمَل) درێژە (تَفصیل) دەدرێ، بەڵام خوا شتێكی فەرمووبێ‌و ئێستا لە قورئاندا مابێ‌و نەسخ بووبێتەوە، یان كاتی خۆی فەرمووبێتی‌و دوایی نەسخ بووبێتەوە، قەت شتی وا نەبووەو نیە، وە هەموو ئەو ڕیوایەتانەی كە لەوبارەیەوە هەن، هی ئەوە نین كە پشتیان پێ ببەسترێ.

ئنجا كە گوتوویانە ئەم ڕستە قورئانییە (مَنْسُوخ)ەو، دوای ئەوەی كە جەنگ‌و جیهاد فەرز كراوەو ئیسلام دەسەڵاتی پەیدابووە ئەم ئایەتە نەسخ بۆتەوە، كەواتە: بۆمان هەیە بەزۆریی خەڵكی مسوڵمان بكەین ! بێگومان ئەوانەی كە وایانگوتوە هەر لە سروشتی دین حاڵی نەبوون، چونكە خوای پەروەردگار لە چەند شوێنانداا ئەوەی تەئكید كردۆتەوە، كە تۆبزییكردن لە ئیسلامدا نیە، جگە لێرە، بۆ وێنە:

١) دەفەرمووێ: ﴿ وَلَوۡ شَآءَ رَبُّكَ لَأٓمَنَ مَن فِي ٱلۡأَرۡضِ كُلُّهُمۡ جَمِيعًاۚ أَفَأَنتَ تُكۡرِهُ ٱلنَّاسَ حَتَّىٰ يَكُونُواْ مُؤۡمِنِينَ ﴿٩٩﴾ ﴾ یونس، واتە: ئەگەر پەروەردگارت ویستبای هەرچی خەڵك هەیە لەسەر زەوی هەمووی دەبوو بە بڕوادار، جا ئایا تۆ زۆریان لێدەكەی‌و خەڵك ناچار دەكەی بیانكەیە بڕوادار ؟! وەك دەبینین پەروەردگار ڕووی ڕەخنە لە پێغەمبەری خوا دەكات‌و بە ئینكارییكردنەوە پێی دەفەرمووێ: نابێ زۆریان لێبكەی.

٢) هەروەها دەفەرموێ: ﴿ وَقُلِ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكُمْ فَمَن شَآءَ فَلْيُؤْمِن وَمَن شَآءَ فَلْيَكْفُرْ ...﴿٢٩﴾ ﴾الكهف، واتە: بڵێ هەق لە پەروەردگارتانەوەیە، کێ حەز دەکا با کافربێ و کێ حەز دەکا با بڕوا بێنێ.

٣) هەروەها خوای پەروەردگار دەفەرموێتە پێغەمبەر ﷺ ﴿ ...وَمَآ أَنتَ عَلَيْهِم بِجَبَّارٍ ...﴿٤٥﴾ ﴾ ق، واتە: تۆ تۆبزییکارنی بەسەریانەوە.

٤) هەروەها دەفەرموێ: ﴿ لَّسْتَ عَلَيْهِم بِمُصَيْطِرٍ ﴿٢٢﴾ ﴾ الغاشیة، واتە: تۆ ناتوانی بەسەریانەوە کۆنتڕۆڵکەربی، واتە: بەسەر دڵ و دەروونیاندا، وە دیارە خەڵکیش بە تۆبزیی ناگونجێ مسوڵمان بکرێ، بەڵکو ئەوپەڕی دەکرێتە مونافیق و لە کوفری ئاشکراوە دەگوازرێتەوە بۆ کوفری پەنهان.

٥) بەڵگەیەکی دیکەش ئەوەیە کە بە دەقی ئایەت خوا فەرموویەتی: سەرانە لە کافرەکان وەربگرن، دەفەرموێ: ﴿ ... حَتَّىٰ يُعْطُوا۟ ٱلْجِزْيَةَ عَن يَدٍ وَهُمْ صَٰغِرُونَ ﴿٢٩﴾ ﴾ التوبة، واتە: هەتا بە ملکەچیی سەرانە دەدەن، کە ڕای ڕاستی زانایان ئەوەیە سەرانە لە هەموو ئەوانە وەردەگیرێ کە لەژێر سایەی دەوڵەتی ئیسلامییدا دەژین، دوای ئەوە کە شەڕ دەکەن لەگەڵ دەوڵەتی ئیسلامییدا، دوایی دەوڵەتی ئیسلامیی بۆی هەیە سەرانەیان لێوەربگرێ[1]، کەواتە: ئیسلام لێدەگەڕێ خەڵك کافربێ، بەڵام سەرانەیان لێوەردەگرێ، هەڵبەتە ئەویش دەبێ دوای شەڕکردن بێت، ئەگەرنا سێ تیرەی (بني قريظة و بني قينقاع بني

---

١) بەڵام سەرانە (جزیة) وەرگرتن شتێکی حەتمیی و فەرز نیە، وە بە پێی ئایەتەکەش کە تاکە ئایەتێکە لەوبارەوە، سەرانە تەنیا لە کافرانی جەنگاوەرو شەڕکەر لەدژی دەوڵەتی ئیسلامیی وەردەگیرێ: ﴿ قَٰتِلُوا۟ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ ... حَتَّىٰ يُعْطُوا۟ ٱلْجِزْيَةَ ... ﴿٢٩﴾ ﴾ التوبة، کەواتە: کۆمەڵێك جەنگیان نەکردبێ لێیان وەرناگیرێ، وەك سێ تیرە جوولەکەکەی مەدینە: (بنو قینقاع، بنو النضیر، بنو قریظة)، کە سەرانەیان لێوەرنەگیراوە، شایانی باسیشە لە زنجیرە وتاری: (ئیسلام و دەوڵەتداریی و حوکمڕانیی) تەوەرەی: (ناموسڵمانان لە کۆمەڵگاو دەوڵەتی ئیسلامییدا). بە درێژیی ئەم مەسەلەیەمان توێژیوەتەوە.

النضیر) لە مەدینەشدا بوونو پێغەمبەر ﷺ سەرانەی لێ وەرنەدەگرتن، چونکە شەڕیان نەکرد لەگەڵ ئیسلامدا، هەڵبەتە هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتەکەش واتایەکەی دەخات، ئەویش ئەوە بووە کە مسوڵمانان ویستوویانە کوڕەکانیان بەزۆر بکەنە مسوڵمانو خوای دادگەریش فەرموویەتی: وامەکەن.

**مەسەلەی هەشتەم**: کە دەفەرموێ: ﴿ قَد تَّبَيَّنَ ٱلرُّشۡدُ مِنَ ٱلۡغَيِّ ﴾، واتە: بە تەئکید سەر ڕاستییو گومڕایی لێك جیابوونەتەوە، سەر ڕاستیی کە لە ئیسلامدا بەرجەستەیەو، گومڕایی لە غەیری ئیسلامدا بەرجەستەیە، لێك جیابوونەتەوە، واتە: مادام ئیسلام بۆ خەڵکی ڕۆشن بۆتەوەو ئیسلام مادام هەقە، پەکی لەسەر کوتەك نەکەوتوەو، ئیسلام بۆخۆی خۆی ساغ دەکاتەوەو، بۆخۆی دەچێتە نێو دڵو عەقڵی خەڵکەوەو، پێویستی بەوەنیە بەزۆر بیئاخنیە نێو دڵو عەقڵی خەڵكو، بەزۆریش نائاخنرێتە عەقڵو دڵی خەڵکەوە، ئەوپەڕی وەك گوتم خەڵك ناچار دەکرێ تووشی ئیزدیواجییەتو نیفاق بکرێ.

**مەسەلەی نۆیەم**: کە دەفەرموێ ﴿ فَمَن يَكۡفُرۡ بِٱلطَّٰغُوتِ وَيُؤۡمِنۢ بِٱللَّهِ فَقَدِ ٱسۡتَمۡسَكَ بِٱلۡعُرۡوَةِ ٱلۡوُثۡقَىٰ ﴾، لێرەدا جێی سەرنج ئەوەیە کە خوای بێهاوەڵ کوفر بە طاغووتی خستۆتە پێش ئیمان بە خواوە، هەر کەسێك کوفر بە طاغووت بکاتو ئیمان بە خوا بێنێ، ئەوە دەستی بە قوڵفەیەکی قایم گرتوە، یان دەستی بە هەنگڵێکی قایم گرتوە، کەناپچڕێ، جا ئێستا با سەرنج بدەین، کە ئایا هۆی پێشخستنی کوفر بە طاغووت، لەسەر ئیمان بە خوا چییە؟! هۆیەکەی ئەوەیە کە تۆ ئەگەر بتەوێ زەوییەك داچێنی بیکەیە نەمامو باخ، یاخود بیکەیە دانەوێڵە: نیسكو نۆك برنجو گەنمو جۆ، ئایا دەبێ چی لێبکەی ؟ پێشێ دەبێ ئەو زەوییە هەڵریژێریو بیکێڵیو پاکی بکەیەوەو ئامادەی بکەی، ئنجا ئەوەی دەتەوێ تێیدا بچێنی، واتە: دەبێ بژارکردن (تخلية) هەبێ، پاشان ڕازاندنەوە (تحلية)، هەر وشەی (لاَ إلَه إلاَّ الله)ش زانایان بە: (وشەی لابردنو چەسپاندن) (كَلِمَة النَّفِي والإثْبَات) پێناسەی دەکەنو، پێشێ (نَفي)ە، ئنجا (إثبات)ە، نەفی هەموو پەرستراوە ساختەکان

دەکات، ئنجا پەرستراویێتی خوای تاکو بێ هاوەڵو بێوێنە ئیسپات دەکات، (لا إله إلاّ الله) هیچ پەرستراو نین، جگە لە خوا ﷻ لێرەشدا بە هەمان شێوەیە، ئەوەی بڵێ: ئیمانم بە خوا هەیە، بەڵام تۆزێکیش ئیمانم بە طاغووت هەیە، ئیمانەکەی بایی فلسێکە، چونکە خوای تاكو پاك دەفەرموێ: ﴿ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَلَمۡ يَلۡبِسُوٓاْ إِيمَٰنَهُم بِظُلۡمٍ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمُ ٱلۡأَمۡنُ وَهُم مُّهۡتَدُونَ ﴿٨٢﴾﴾ الأنعام، واتە: ئەوانەی ئیمانیان هێناوەو زوڵمیان تێکەڵ بە ئیمانەکەیان نەکردوە {کە لێرەدا وشەی (ظلم)[1] یانی: شیرك، شیریان تێکەڵ بە ئیمانەکەیان نەکردبێ}، وەك لە (صحیح البخاري)دا هاتووە ﴿أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمُ ٱلۡأَمۡنُ﴾، ئا ئەوانە ئەمینو پارێزراون لە عەزابی خواو ڕێی ڕاستیان گرتوە، وشەی طاغووتیش وەك باسمان کرد زۆربەی توێژەرانی قورئان، یەکێك لەوانە: (ابْنُ جَرِير الطَّبَرِي) دەڵێ: (الطاغُوت كُلُّ مَعْبُودٍ سِوَى الله) طاغووت هەر پەرستراوێکە جگە لە خوا، هەر پەرستراوێك جگە لە خوا، دار بێ، مانگ بێ، خۆر بێ، بەرد بێ، ئینسان بێ، هەواو ئارەزوو بێ، مۆدێل بێ، حیزب بێ، فیرعەونێك بێ، لە بەرگی دیندا بێ، هەر شتێك بێ غەیری خوای پەروەردگار بپەرسترێ، واتە: ئەو شتانەی کە دەبێ تەنیا بۆ خوا بکرێن، بۆی بکرێن، یان ئەو هەڵوێستەی دەبێ لە بەرانبەر خوادا وەربگیرێ، بۆ ئەو وەربگیرێ، ئەوە مانای وایە کراوە بە پەرستراو.

بەڵام من پێم وایە وشەی طاغووت لە قورئاندا زیاتر بەمانای ئەو سەرکردانە دێ، کە خەڵك گومڕا دەکەن، چونکە هەم لێرەدا کە دەفەرموێ: ﴿وَٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ أَوۡلِيَآؤُهُمُ ٱلطَّٰغُوتُ يُخۡرِجُونَهُم مِّنَ ٱلنُّورِ إِلَى ٱلظُّلُمَٰتِ﴾، وە ئەوانەی بێبڕوان، طاغووت دۆستو پشتیوانیانە لە ڕووناکیی دەریاندێننو

---

١) عن عبدالله قال: لما نزلت: ﴿ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَلَمۡ يَلۡبِسُوٓاْ إِيمَٰنَهُم بِظُلۡمٍ ...﴿٨٢﴾﴾ الأنعام، قال أصحابه: رأينا لم يظلم نَفْسَهُ ؟ فنزلت: ﴿... إِنَّ ٱلشِّرۡكَ لَظُلۡمٌ عَظِيمٞ ﴿١٣﴾﴾ لقمان، رواه البخاري، كتاب التفسير: (٤٦٢٩).

بۆ تاریکاییانیان دەبەن، وە هەم لە هەرجێیەکی دیکە کە خوا باسی طاغووت دەکات وا باسی دەکات، کە هەستو ئیرادەی هەیەو، هەڵوێستی هەیە شت دەکات، نەك وا باسی بکات وەك بتو صەنەمێکی داتاشراو بێو ئیرادەی نەبێ، لەبەرئەوە من پێم وایە زیاتر طاغووت بریتیە لەو سەرکردانەی کە خەڵك بەرێی غەیری شەریعەتدا دەبەنو، خۆیان لێدەکەنە پەرستراوو پەروەردگار، وەك فیرعەونو وێنەی وی.

ئنجا خوای بالادەست دەفەرموێ: ﴿ فَمَن يَكْفُرْ بِالطَّاغُوتِ وَيُؤْمِن بِاللَّهِ ﴾، ئەوەی کوفر بە طاغووت بکا، وە ئیمان بە خوا بێنێ ﴿ فَقَدِ اسْتَمْسَكَ بِالْعُرْوَةِ الْوُثْقَىٰ لَا انفِصَامَ لَهَا ﴾، واتە: ئەوە دەستی لە قولفەیەکی قایم گرد کردوە، کە پچڕانی بۆنیە، کەواتە: ئیمان قوڵفەیەکی مەحکەمە کە ئینسان دەستی تێدەگرێ، بۆ ئەوەی نەکەوێ، ئینسان کاتێك لە شوێنێك بێ خەریکی کەوتن بێت چی دەکات؟ شتێك دێنێ دەستی تێبگرێ، جا ئەگەر قوفڵەیەکی مەحکەم هەبێت قەت نەپچڕێ، ئەوە مانای وایە ناکەوێ، جا خوا ﷻ دەفەرموێ: ئەو قوڵفە نەپچڕاوەی یان لە پچڕان نەهاتووەی کە ئینسان دەبێ لە ژیانیدا دەستی تێ بگرێ، بریتیە لە: ئیمانو خوا بەیەکگرتن (توحید)، بەڵام چ ئیمانێك، ئیمانێك کە کوفر بە طاغووتی لەپێش دابێ، دوایی دەفەرموێ: ﴿ وَاللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴾، وە خوا بیسەرە بۆ قسەکانتان بۆ شایەتمانتان بۆ تەعبیرو دەربڕینەکانتان، وە زاناشە بە کردەوەکانتان بە نهێنیەکانتان کە لە دڵتاندا پەنهانتان کردوون.

**مەسەلەی دەیەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ اللَّهُ وَلِيُّ الَّذِينَ آمَنُوا ﴾، خوا دۆستو پشتیوانو یارمەتیدەرو خۆشەویستو مشوورخۆرو سەیدو سەروەری بڕوادارانە، وشەی (ولي) ئەو مانایانەی هەموو هەیە، جا ئەوە زۆر دڵی ئینسانی ئیماندار خۆش دەکات، ئێمە بێ پشتیوان نین، ئێمە دۆستمان هەیە، پشتیوانمان هەیە، مشوورخۆرمان هەیە، یارمەتیدەرمان هەیە، مشوورگێڕمان هەیە، کە خۆشی دەوێین، بە تەنگمانەوەیە ئەویش خوایە ﷻ، وە ئەویش خاوەنی هەموو

دەستەڵاتێکە، بەڵام ویلایەتی (وِلایة)ی خوا، وە وەلایەتی (وَلایة)ی خوا {ویلایەت واتە: سەرپەرشتیکردنو وەلایەت واتە: دۆستایەتیی} ویلایەتو وەلایەتی خوای بەخشەر بۆ ئیمانداران، بەقەدەر ئیمانیانەو، ئینسان تا ئیمانی زیاتر بێت، خوای بەخشندە، زیاتر مشووری لێ دەخواتو زیاتر دۆستایەتیی دەکاتو زیاتر ئاگای لێی دەبێ، جا ئایا خوا چی بۆ ئیمانداران دەکات ؟

﴿ يُخْرِجُهُم مِّنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ ﴾، لە تاریکاییان دەریازیان دەکات بەرەو ڕۆشنایی، تاریکایی جۆری زۆرن، بەڵام ڕووناکیی یەکە، زۆر جۆرە تاریکایی هەیە تاریکایی شەو هەیە، تاریکایی سێبەر هەیە، تاریکایی هەور هەیە، بۆیە خوا ﷻ وشەی: (ٱلظُّلُمَٰتِ)ی بەکارهێناوە بۆ ئەو کوفرو گوناهو تاوانو لادانو هەڵەو کەموکووڕییانەی، کە دەبێ ئینسان خۆیان لێ بپارێزێ، وە وشەی ڕووناکیشی بەکارهێناوە، بۆ پێناسەکردنی ئیمان، چونکە ئیمان یەك شتە، خوا بپەرستە، بەڵام کوفر زۆر شتە ڕۆژێك کوفری ڕۆژهەڵاتی هەیە، ڕۆژێك کوفری ڕۆژئاوایی هەیە، ڕۆژێك کوفری خۆماڵیی هەیە، کوفری عالەمیی هەیەو، کوفری مەحەللی هەیە، کوفری ئیلحاد هەیەو، کوفری نیفاق هەیەو، کوفری بێ دینایەتیی (سیکۆلاریزم) هەیەو، کوفری خاوەن کتێبەکان هەیەو، کوفری شیركو بتپەرستیی هەیەو ... هتد ! کوفر جۆراو جۆرە، بەس ئیمان یەك ئیمانە !

**مەسەلەی یازدەیەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ أَوْلِيَآؤُهُمُ ٱلطَّٰغُوتُ ﴾، وە ئەوانەی بێبڕوان دۆستو پشتیوانەکانیان، یارمەتیدەرەکانیان، مشوورخۆرەکانیان، طاغووتەکانن، جا ئایا طاغووتەکان چی لە شوێنکەوتووانی خۆیان دەکەن؟

﴿ يُخْرِجُونَهُم مِّنَ ٱلنُّورِ إِلَى ٱلظُّلُمَٰتِ ﴾، لە ڕووناکیی دەریاندێننو بەرەو تاریکییەکانیان دەبەن، جا لێرەدا ڕەنگە یەکێ بڵێ: جا کابرا جارێ هەر ئیمانی نەهێناوە، بۆچی خوای زانا دەفەرموێ: لە ڕووناکیی دەریدێنێ بۆ تاریکییەکان ؟ دەڵێین: ڕاستە، بەڵام مادام کەسێك قورئانی لەبەردەست بێو بتوانێ ئیمان بێنێ، وەك بڵێی لەنێو ڕووناکییدایە، بەڵام پشتی تێدەکات، وە دەشگونجێ

مەبەست لە (النُّور) لێرەدا (نور)ی فیطرەت بێ، ئەو فیطرەتو سروشتەی کە خوای داهێنەر بۆ ئێمەی دروست کردوەو، هەموو کەسێك بە فیطرەت خوا دەناسێ، وەك فەرموویەتی: ﴿ فَأَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ حَنِيفًا فِطْرَتَ ٱللَّهِ ٱلَّتِى فَطَرَ ٱلنَّاسَ عَلَيْهَا لَا تَبْدِيلَ لِخَلْقِ ٱللَّهِ ...﴿٣٠﴾ ﴾ الروم، واتە: ڕووی خۆت ڕاست ڕاگرە بۆ دینێکی پاك، ئەو دینە پاکە هەر هەمان ئەو سروشتەیە کە خوا خەڵکی لەسەر دروست کردوەو سروشتناندوە، کەواتە: ئەوانە لەنێو نووری فیطرەتدا بوون، بەڵام طاغووتەکان دەریانهێنان بەرەو تاریکایی ئەو ڕێچکەو بیردۆزەو بەرنامانە کە بۆیان دادەنێن، بۆ ئەوەی بیانکەنە کۆیلەو خزمەتکاری خۆیان، وە بەو شێوە بەکاریان بێنن کە لە بەرژەوەندیی ئەوانداییە.

**مەسەلەی دوازدەیەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِ هُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴾، ئەوانە خاوەنی ئاگرن، یاخود هاوەڵی ئاگرن، بە هەمیشەیی تێیدا دەمێننەوە، بێگومان خراپترین شت کە ئینسان ببێتە خاوەنی، دۆزەخو ئاگرە، وە خراپترین ڕەفیق کە ئینسان ببێتە هاودەمی، بریتیە لە ئاگری دۆزەخ.

خوا ﷻ بە لوتفو کەرەمی خۆی لەو کەسانەمان بگێڕێ کە شایستەی ئەوە دەبن، خوا دۆستایەتییان بکاتو پشتیوانییان بکاتو سەرپەرشتیی کاروبارییان بکات، وە خوای بە بەزەیی لەو کەسانەمان بگێڕێ کە ئیمانێکی وایان دەبێ، وایان لێبکات شایستەی ئەوەبن کە خوای بەخشەر هەرچی مشووری دنیاو دوارۆژیانە بۆیان بخواتو، عاقیبەتو سەرەنجامی هەموو لایەکمان خێر بکات.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی پەنجاو سێ یەمین

## پێناسەی ئەم دەرسە

لەم دەرسەماندا ئایەتەکانی ژمارە: (٢٥٨، ٢٥٩، ٢٦٠) لە سوورەتی (البقرة) دەتوێژینەوە، ئەم سێ ئایەتە باسی خواناسییو دوارۆژ ناسییو زیندووبوونەوە دەکەن، لە باسی خواناسییدا مشتومڕێکی نێوان ئیبراهیم عليه السلامو یەکێ لە دەستەڵاتداران، کە مێژوونووسانو توێژەرەوانی قورئان دەڵێن: نەمرووود بووە دەکات، وە لە بابەتی دوارۆژناسییدا، باسی کەسێك دەکات کە بەلای ئاوەدانییەکدا تێپەڕیوە کە وێرانو کاول بووەو، خەڵکەکەی هەموو مردوەو پێی سەیربووە، خوای ژیێنەر زیندوویان بکاتەوە، بەڵام خوا سبحانه وتعالى سەد ساڵ مراندوویەتیو دواییش زیندووی کردۆتەوە ! وە لە باسی زیندووبوونەوەشدا باسی ئەوە دەکات کە ئیبراهیم عليه السلام داوا لە خوای پەروەردگار دەکات پێشانی بدات: چۆن مردووان زیندوو دەکاتەوە؟ ئەویش وەك ئەزموونێکی کردەیی پێی دەفەرموێ: کە چوار باڵندە بگرێو دوایی بیانهەنجنێو وردیان بکاتو هەر پارچەی لە شوێنێك دابنێ، دوایی بانگیان بکاتو بە فەرمانی خوای باڵادەست زیندوو دەبنەوە.

﴿ أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِى حَآجَّ إِبْرَٰهِـۧمَ فِى رَبِّهِۦٓ أَنْ ءَاتَىٰهُ ٱللَّهُ ٱلْمُلْكَ إِذْ قَالَ إِبْرَٰهِـۧمُ رَبِّىَ ٱلَّذِى يُحْىِۦ وَيُمِيتُ قَالَ أَنَا۠ أُحْىِۦ وَأُمِيتُ ۖ قَالَ إِبْرَٰهِـۧمُ فَإِنَّ ٱللَّهَ يَأْتِى بِٱلشَّمْسِ مِنَ ٱلْمَشْرِقِ فَأْتِ بِهَا مِنَ ٱلْمَغْرِبِ فَبُهِتَ ٱلَّذِى كَفَرَ ۗ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّـٰلِمِينَ ﴿٢٥٨﴾ أَوْ كَٱلَّذِى مَرَّ عَلَىٰ قَرْيَةٍ وَهِىَ خَاوِيَةٌ عَلَىٰ عُرُوشِهَا قَالَ أَنَّىٰ يُحْىِۦ هَـٰذِهِ ٱللَّهُ بَعْدَ مَوْتِهَا ۖ فَأَمَاتَهُ ٱللَّهُ مِا۟ئَةَ عَامٍ ثُمَّ بَعَثَهُۥ ۖ قَالَ كَمْ لَبِثْتَ ۖ قَالَ لَبِثْتُ يَوْمًا أَوْ بَعْضَ يَوْمٍ ۖ قَالَ بَل لَّبِثْتَ مِا۟ئَةَ عَامٍ فَٱنظُرْ

إِلَىٰ طَعَامِكَ وَشَرَابِكَ لَمْ يَتَسَنَّهْ ۖ وَانظُرْ إِلَىٰ حِمَارِكَ وَلِنَجْعَلَكَ آيَةً لِّلنَّاسِ ۖ وَانظُرْ إِلَى الْعِظَامِ كَيْفَ نُنشِزُهَا ثُمَّ نَكْسُوهَا لَحْمًا ۚ فَلَمَّا تَبَيَّنَ لَهُ قَالَ أَعْلَمُ أَنَّ اللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴿٢٥٩﴾ وَإِذْ قَالَ إِبْرَاهِيمُ رَبِّ أَرِنِي كَيْفَ تُحْيِي الْمَوْتَىٰ ۖ قَالَ أَوَلَمْ تُؤْمِن ۖ قَالَ بَلَىٰ وَلَٰكِن لِّيَطْمَئِنَّ قَلْبِي ۖ قَالَ فَخُذْ أَرْبَعَةً مِّنَ الطَّيْرِ فَصُرْهُنَّ إِلَيْكَ ثُمَّ اجْعَلْ عَلَىٰ كُلِّ جَبَلٍ مِّنْهُنَّ جُزْءًا ثُمَّ ادْعُهُنَّ يَأْتِينَكَ سَعْيًا ۚ وَاعْلَمْ أَنَّ اللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٢٦٠﴾ ﴾.

## مانـای وشـه به وشـــەی ئایەتەکـــان

((ئایا سەرنجی ئەو کەسەت نـەداوە کـە شـەڕە قـسەی لەگـەڵ ئیبـراهیمـدا کـرد، لـەبارەی پەروەردگـارییـەوە، لـە سـۆنگەی ئـەوەوە، کـە خـوا دەسـتـەڵاتی دابۆیـەو لەخۆی بایی بووبوو، کاتێك ئیبـراهیم پێی گـوت: پەروەردگـارم کەسێکە دەژیەنیّ‌و دەمرێنیّ، (ئـەویش) گـوتی: منـیش دەژیەنـمو دەمـرێنم، ئیبـراهیم گـوتی: دەجـا وەك چۆن خـوا خۆر لە ڕۆژهەڵاتەوە دێنیّ تۆش لە ڕۆژئـاوا بیهێنە ! ئیـدی بابـای کە بێبـڕوا بوو سەرسـامو دەستەوستان بوو، وە خوا ڕێنمایی کۆمەڵـی ستەمکـاران ناکات ﴿٢٥٨﴾ یـان ئایا بابای وەك ئەو کەسەت بینیوە کە بەلای ئاوەدانییـەکدا ڕەتبوو، لە حاڵێکدا کـە چۆڵو (دیوارەکـانی) ڕووخـا بـوو بەسـەر سـەربارەکانیـدا، (لەبـەر خۆیەوە) گوتی: چۆن خـوا (خەڵکی) ئەم شارە پاش مردنیان زینـدوو دەکـاتەوە ؟! ئیدی یەکسەر خوا ماوەی سەد ساڵ مراندیو، پاشـان زینـدووی کـردەوە فـەرمووی: چەند ماویەوە ؟ گوتی: ڕۆژێك یان هەندێك لە ڕۆژێـك ماومەوە، فـەرمووی: بەڵکو سەد سـاڵت پێچوە، دەجا تەماشای خواردنو خواردنەوەکەت بکە، هیچ نەگۆڕاوە، وە سەرنجی کەرەکەت (گوێدرێژەکـەت) بـدە، وە تـاکو بتکەینـە نیشانە (و بەڵـگە) بـۆ خەڵکی، وە سەرنجی ئێسقانەکان بدە، چۆن بەرزیـان دەکەینـەوە، پاشـان گۆشـتیان بەبەردا دەکەین ! جا کاتێـك بـۆی ڕوون بـۆوە، گـوتی: (بـە دڵنیاییـەوە) دەزانم کـە

خوا لەسەر هەمووو شتێك توانادارە ﴿٢٥٩﴾ وە یادبکەوە کاتێك ئیبراهیم گوتی: پەروەردگارم پێشانم بدە چۆن مردووان دەژیێنیەوە، خوا فەرمووی: ئەدی ئیمانت نەهێناوە ؟ گوتی: با، بەلاَم تاکو دلّم (زیاتر) دابمەزرێ، فەرمووی: دەجا چوار جۆر لە بالّندان بگرەو لە خۆتیان نزیك بخەوە، پاشان (سەریانبڕەو) هەر پارچەیەکیان بخە سەر کێوێك، دوایی بانگیان بکە بە ڕاکردن دێنە لات، وە بزانە کە خوا بالاّدەستی کاربەجێیە﴿٢٦٠﴾)).

## شیکردنەوەی هەندێك لە وشەکان

(حَآجَّ )؛ واتە: شەڕە قسەی کرد وتووویژی کرد، وشەی (حَاجَّ) لە وشەی (حُجَّة)وە هاتوە، کە هەرکامێکیان (حُجَّةَ) بێنێتەوە (الحُجَّةُ: الدَّلاَلَةُ المُبَيِّنَة للمحَجَّة) واتە: (حُجَّة) بەلگەیە، چونکە ڕێنماییەکی ڕۆشنکەرەوەیە بەرەو ئەو ڕێبازەی کە تۆ بەڕاستی دەزانی.

(ٱلْمُلْكَ )؛ (المُلْكُ: هُوَ التَّصَرّفُ بالأمْرِ والنَّهْي في الجمهُورِ، أَو السُلْطَة السِّيَاسِيَة)، واتە: (مُلْك) یانی: حوکمڕانیی، بریتیە لەوەی کە مرۆڤ بۆی هەبێ فەرمانو نەهی بەسەر خەلّکدا بکات، یان دەسەلاّتی سیاسی بەدەستەوەبێ، کەواتە: دیارە ئەوەی کە وتووویژی لەگەلّ ئیبراهیمدا کردوە پادشاو حوکمڕان بووە.

(فَبُهِتَ )؛ (بُهِتَ: تَحَيَّرَ وَدُهِشَ) سەرسام بوو، وە دەستەوستان بوو، بوهتان بۆچی پێی دەگوترێ: بوهتان؟! {والبُهتانُ: كَذِبٌ يُبْهِتُ سَامِعَهُ لِفَظَاعَتِهِ، كَمَا قَالَ: ﴿... سُبْحَٰنَكَ هَٰذَا بُهْتَٰنٌ عَظِيمٌ ﴿١٦﴾﴾ النور}، بوهتان بریتیە لە درۆیەك کە بیسەرەکەی سەرسام دەکات لەبەر ئەوەی هێندە شتێکی ناقۆلاّیە، جا لە کوردەواریی خۆماندا هەرشتێك بۆ کەسێك هەلّببەسترێ پێی دەگوترێ: بوختانو بە عەرەبیی پێی دەگوترێ: (بُهْتَان)، بەلاّم تۆمەتی داوێن پیسیی

پێـی دەگـوترێ: (قَذْف)، کـە دیـارە ئـەویش هـەر بوهتانـە، بـەڵام بوهتـانێکی تایبەتە، کە بریتیـە لە تۆمەتبارکردنی کەسێك بە داوێن پیسیی.

(قَرْيَةٍ): (قَرْيةَ) لە بەکارهێنانی قورئاندا واتە: شار، بە شاری گـەورەش دەگـوترێ، بەڵام ئێستا لە زاراوەی باو (عرف)دا (قَرْيَة) بە (دێ)و (گونـد)و ئاوەدانییـەکی بچووك، دەگوترێ: (القَرْيَةُ: اسْمٌ لِلمَوْضِعِ الذي يَجْتَمِعُ فيـه النَّاسُ، ولِلنـاسِ جَمِيعاً، وَيُسْتَعْمَلُ في كُلِّ وَاحِدٍ مِنْهُمَـا)، واتە: (قَرْيَة) بەو شوێنە دەگوترێ کە خەڵکێکی زۆری لێ کۆببێـتەوە، هەروەها بە خودی خەڵکێکیش دەگوترێ، کـە لـە شـوێنێك کۆبوونەتـەوەو بـە هەردووکیـشیان پێکـەوە دەگـوترێو، بـە هەرکامێکیشـیان بە جیا جیا دەگوترێ.

(خَاوِيَةٌ): (أَصْلُ الخَوَاءِ: الخَلاءُ، يُقَالُ خَوِيَ بَطنُهُ مِنَ الطعَامِ، وَخَوِيَ سَقَط) و ﴿ خَاوِيَةٌ عَلَىٰ عُرُوشِهَا ﴾، یعني: ساقيطة، واتـە: وشەی: (خاوية) لە بنەڕەتـدا یـانی: بۆش، دەگـوترێ: زگـی لـە خـواردن بەتاڵـبوو، وە (خَوِيَ) یـانی: کـەوت، ڕووخـا ﴿ خَاوِيَةٌ عَلَىٰ عُرُوشِهَا ﴾، سـەقفەکەی ڕووخـاوەو دوایـی دیوارەکـانی بەسـەردا ڕووخـاون...

(عُرُوشِهَا): (عُرُوش) کۆی (عَرْش)ە، واتە: سـەقف، سەربان، (العَرْشُ فـي الأَصْلِ: شَـيءٌ مُسَقَّفٌ، وَجَمْعُـهُ عُـرُوشٌ، ومِنْـهُ قِيـلَ: عَرَشْـتُ الكَـرْمَ وَعَرَّشْـتُهُ: إِذَا جَعَلْـتَ لَـهُ كَهَـيْئَةِ الـسَّقْفِ)، واتــە: (عَـرْش) لـە ئەسـڵدا هـەر شـتێکە کـە سەربـانی بۆ کرابێ، کۆیەکەی (عُرُوش)ە، بۆیـە کەسێك کـە کـەپر دەکات بـۆ داری مێو، دەڵێ: (عَرَشْتُ الكَرْمَ وَعَرَّشْتُهُ).

(لَبِثْتَ إِلَىٰ): (لَبِثَ بالـمَكَانِ: أقَامَ بِـهِ مُلازِمَاً لَـهُ)، (لَبِثَ): واتـە: مايـەوە، یـانی: بـە مردوویی ماوەتـەوە، چونکـە (لَبِثَ بالـمَكَـانِ)، واتـە: لـەو شـوێنە مايـــەوەو چۆڵی نەکرد.

(لَمْ يَتَسَنَّهْ ): (أي: لَـمْ يَتَغَيَّـر بِمَـرِّ السِنـِينِ عَلَيـهِ) واتـە: بـەوەی کـە سـاڵی زۆری بەسـەردا تێپـەڕیون، گـۆڕانی بەسـەردا نەهاتوە.

(نُنشِزُهَا): (النَّـشْـزُ: الـمَكَانُ الـمُرْتَفِعُ مِـنَ الأَرْضِ)، (نُنْـشِزُهَا): واتــە: بــەرزی دەکەینــەوە، بــەڵام لێــرە (النَّـشْـزُ) بــە شــوێنێکی بــەرز دەگــوترێ لــە زەوی، (وَنَشَـزَ فلانٌ عَنِ مَكَـانه: نبـا) واتـە: فـلان لە شوێنی خۆی هەڵسا.

(لِّيَطْمَئِنَّ ): بۆ ئەوەی ئارامبــێ (الطُّمأْنِينَـةُ والإِطْمِئْنَـانُ: الـسُّكُونُ بَعْـدَ الإِنْزِعَـاجِ) واتـە: (طُمأْنِينَةُ وإِطْمِئْنَانُ) بریتیە لە داسەکنانو نەجووڵان، دوای دڵەڕاوکەو جـووڵان.

(فَصُرْهُنَّ ): (أَمِلْهُـنَّ مِن الصُّور أي: الـمَيـل)، واتـە: بەلای خۆتیـانـدا بێنـە.

(سَعْيًـا ): (الـسَّعيُ: الـمَشـيُ الـسَّرِيع وَهُـوَ دُونَ العَـدْوِ)، واتـە: (سَعي) ڕۆیـشتنی خێرایـە، کە کەمتـرە لە ڕاکردن.

(عَزِيزٌ): (العِـزَّةُ: حـالَةٌ مَانِعَةٌ للإِنْسَانِ مَنْ أَنْ يُغْلَبَ)، (عِزَّة) ئەوەیـە کـە ئینـسـان حاڵـەتی وابێ کەس بەسـەریدا زاڵ نەبێ، وە لێـرەوەش گوتــراوە: (أَرْضٌ عَـزَازٌ، أي: صُلْبَةٌ) واتە: زەوییـەکی پتەو، کە بەزەحمـەت نەبێ هەڵنەقـەنرێ.

(حَكِيمٌ): واتە: کاربـەجێ، (عَزِيـز)یش ئێمە بـە (زاڵ) لێکـی دەدەینـەوە، جـا دەڵـێ: (حَكَمَ: أَصْلُـهُ مَنَـعَ مَنْعَاً للإِصلاَح، ومِنـهُ سَميت اللِّجَـام: حَكَمَـةَ الدَّابـة) واتـە: (حَكَمَة) بەو لغـاوە دەگوترێ کە لە دەمـی ئەسـپو ئەوانـە دەکـرێ، بـۆ ئـەوەی لـەوەڕ نەخـوا، وە ئەسڵی وشـەی: (حَكَمَ) واتـە: شتێکی ڕێ لێگـرت بەمەبەسـتی ئەوەی کە چاکـی بکـات، وەك چۆن لغـاو لە دەمی ئەسـپ دەکرێ، بۆ ئەوەی کـە گیـا نـەخوات، تاکو بتوانـێ بڕواو بە خواردنــەوە سەرقـاڵ نـەبێ.

## مانـــای گشـــتی ئایەتەکـــان

لـەم سێ ئایـەتە خوای بیسەرو بینـەر، سێ بەسـەرهاتمان بۆ دەگێڕێتەوە:

**بەسەرهاتی یەکەمیان**: بەسـەرهاتی ئیبـراهیمە ﷺ لەگـەڵ حوکمڕانێك، یەکێك لـە پادشـاکان، کـەوا دیـارە ئـەو پادشـایە خـۆی بـە پـەروەردگار زانیـوەو لافـی پەروەردگاریـەتی لێـداوە، دەفـەرموێ: ﴿ أَلَمۡ تَرَ إِلَى ٱلَّذِي حَآجَّ إِبۡرَٰهِـۧمَ فِي رَبِّهِۦٓ أَنۡ ءَاتَىٰهُ ٱللَّهُ ٱلۡمُلۡكَ ﴾، ئایا سەرنجی ئەو کەسەت نـەداوە کە شەڕە قسەی لەگەڵ ئیبـراهیمـدا کـرد، دەربـارەی پـەروەردگاری ئیبـراهیم، بەهۆی ئـەوەوە کە خـوا دەسـتەڵاتی دابۆیـەو کردبـووی بـە حـوکمڕان، وە لـەخۆی بـایی بووبـوو ! جـا توێژەرەوانی قورئان، مێژوونووسان زۆر بە تەفصیل باسی ئەوەیان کردوەو ئێستا فیلمیشیان لەسـەر دەرهێنـاوەو دەڵێن: ئـەو پادشـایە نـەمروود بـووە، نـەمروودی کوڕی کەنعان کە لە ناوچەی خوارووو نێوەڕاستی عێراق بووە، هەندێکی دیکـەش دەڵێـن: لە شوێنی دیکـەی عێراق بووە، لەخۆی بایی بووە خۆی بـە پەروەردگـار زانیوەو ئیددیعـای ئەوەی کـردوە، کە ئەو پەروەردگاری ئەو خەڵکەیەو لـەوبارەوە موناقەشـەی لەگـەڵ ئیبـراهیمـدا کـردوە، دیـارە ئـەو بـە ئیبـراهیمی گوتـوە: مـن پەروەردگـارتم، تـۆ هـیچ پـەروەردگاری دیکـەت نیـە، کـێ پەروەردگـاری تۆیـە؟ (ئیبـراهیم)یش پێناسەی خوای پەروەردگاری بۆ دەکاتو دەڵـێ: ﴿ إِذۡ قَالَ إِبۡرَٰهِـۧمُ رَبِّيَ ٱلَّذِي يُحۡيِۦ وَيُمِيتُ ﴾، پەروەردگـارم ئەو کەسەیە کـە دەژیـەنێو دەمرێنـێ، خەڵکی زیندوو دەکات، وە خەڵکیش دەمرێنـێ، واتـە: ئـەوەی کـە ژیـان دەدات، وە ئەوەی کە ژیان دەسێنێتەوە، تەنیا خوای پەروەردگارە، ﴿ قَالَ أَنَا۠ أُحۡيِۦ وَأُمِيتُ ﴾، دیـارە ئـەویش سەفـسەطـەی کـردوەو بـە چەواشـەکاریی گوتوویـەتی: منـیش دەژیەنمو دەمرێنم، جـا لـە کتێبـەکانی مێژوودا دەڵێ: ئـەو پادشـایە، کابرایـەکی هێنا حوکم درابوو بە مـەرگ (إعدام)، گـوتی: ئایـا ئـەوە مـەحکووم نـەکراوە بـە

مەرگ (إعدام) کە دەبێ لە سێدارە بدرێ ؟! دەبڕۆ ئەوە ئازادم کردی ! واتە: لە حوکمی مردوودا بوو من زیندووم کردەوە ! کابرایەکی بێ گوناهیشی هێناو گوتی: ئەوەش زیندوو نیە؟ گوتیان: با، گوتی: لەملی بدەن، ئیدی کوشتیو گوتی: ئەوە ئەمیشم مراند ! مانای وایە ژیانم بەوەی یەکەمیانداو ئەوەشیان ژیانم لێ سەندەوە ! هەڵبەتە ئەوە چەواشەکاریی بوو، چونکە ئەوەی ئیبڕاهیم ﷺ مەبەستی بوو ئەوەیە کە خوای پەروەردگار ژیان بە شتێك دەدات کە ژیانی نیە، وە دوایی ژیان لە کەسێك دەستێنێ کە زیندووە، ئەویش نەك بە زوڵم، بەڵکو بە شێوەیەکی ئاساییو بەپێی سوننەتێك کە خوای پەروەردگار دایناوە، بۆیە کاتێك ئەو کابرایە ئەو چەواشەکارییە دەکات، ئیبراهیم بەڵگەکە بەشێوەیەکی دیکە دەخاتەڕوو، کە نەتوانێ ملەجیڕە بکات: ﴿ قَالَ إِبْرَٰهِـۧمُ فَإِنَّ ٱللَّهَ يَأْتِى بِٱلشَّمْسِ مِنَ ٱلْمَشْرِقِ فَأْتِ بِهَا مِنَ ٱلْمَغْرِبِ ﴾، ئیبڕاهیم ﷺ گوتی: باشە خوا هەموو ڕۆژێ خۆر لە ڕۆژهەڵاتەوە دێنێ، تۆ جارێك لە ڕۆژئاواوە بیبە بۆ ئەولای، ئایا لێرە دەتوانێ ملەجیڕە بکات ؟ نەخێر، ﴿ فَبُهِتَ ٱلَّذِى كَفَرَ ﴾، ئەوەی بێبڕوا بوو سەرسامو دەستەوستان بوو هیچی پێ نەکرا، ئنجا مێژوو دەڵێ: لە ئەنجامی تێکشکانی لەو وتوووێژو موناقەشەیەدا گوتیان: یەڵڵا بێنن ئاگری بۆ هەڵبکەنو بیخەنە نێو مەنجەنیقەوەو فڕێی دەنە نێو ئاگر، جا زۆر کەس لە کوردەواریی خۆمان وادەزانێ مەنجەنیق خودی ئاگرەکەیە ! نا، بەڵکو مەنجەنیق: ئامێرێك بووە ئیبراهیمیان تێخستوەو بەو مەنجەنیقە فڕێیان داوەتە سەر بڵێسەی ئاگرەکە، چونکە مەشخەڵی ئاگرەکە ئەوەندە بەرزبووە، چەند ڕۆژان هەر داریان کۆکردۆتەوەو دوایی کە ئاگریان تێبەرداوە، ئەوەندە بەرزبووە، نەیانتوانیوە ئاوا فڕێیبدەنە نێویو کەس نەیتوانیوە هەر نیزیکی ئاگرەکەش بکەوێ، بۆ ئەوەی نەسووتێو نەپرووکێ، کە دەڵێ لەسەرێ باڵندەی دەپرووکاند، وە مەنجەنیق ئامێرێك بووە لەکاتی شەڕدا بەردی سووردەوەکراوەو ئاسنیان پێ فڕێ داوەتە نێو قەڵاوە، بۆ ڕووخاندنیو لە جێی هاوەنو تۆپی ئێستا بەکاریانهێناوە، جا ئیبراهیمیان خستۆتە نێو ئەو مەنجەنیقەوەو بەو مەنجەنیقە

فڕێیـان داوەتــە نێـو مەشـخەڵی ئـەو ئـاگرە، کـە بەسـەرهاتەکەی لـە سـوورەتی (الأنبیـاء)دا باسکراوە، وەك خـوای پـەروەردگار دەفـەرموێ: ﴿ قَالُوا۟ حَرِّقُوهُ وَٱنصُرُوٓا۟ ءَالِهَتَكُمْ إِن كُنتُمْ فَٰعِلِينَ ﴿٦٨﴾ قُلْنَا يَٰنَارُ كُونِى بَرْدًا وَسَلَٰمًا عَلَىٰٓ إِبْرَٰهِيمَ ﴿٦٩﴾ ﴾، واتە: گوتیـان ئیبـراهیم بسووتێنن‌و پەرسـتـراوەکانتان سـەربخەن، ئەگـەر ڕاسـت دەکـەن {جـا ئـەوە دەبێ چ پەرسـتـراوێك بێ، کـە پێویـستی بـەوەبێ ئـەوەی کـە دەیپەرستێ سەری بخات، خۆی دەبێ پەرسـتـراو پەرسـتـارەکانی خـۆی سـەربخات، ئنجـا دوای ئـەوەی کـە فڕێـی دەدەنـە نێـو ئـاگر} گوتمـان: ئـەی ئـاگر سـاردبەوەو سەلامەتبە لەسەر ئیبراهیم، کە ئیبراهیم‌ﷺ دیارە دەربازی دەبێ، وە بۆ زانیاری ئێوە ئەو بەسـەرهاتە نەك لە قورئاندا بەڵکو لە کتێبە دینیی‌و مێژوییەکانیشدا هەر هاتوە، واتە: ئەو مێژووەی کە خەڵـکی نامـسوڵمانیش نووسـیویەتی، ﴿ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾، بێگومان خوا ڕێنمایی کەسانی ستەمکار ناکات.

**بەسـەرهـاتی دووەمیـان،** کـە دەفـەرموێ: ﴿ أَوْ كَٱلَّذِى مَرَّ عَلَىٰ قَرْيَةٍ وَهِىَ خَاوِيَةٌ عَلَىٰ عُرُوشِهَا ﴾، واتـە: ئایـا کەسـی وات بینیـوە، وەك ئـەو کەسـەی کـە بـەلای شـارو ئاوەدانییەکـدا ڕۆیـی، کـە دیوارەکـانی ڕووخابوونـە سـەر سـەربانەکان، واتـە: سەربانەکە تەپی بوو دیارە دیوارەکان درەنگتـر دەڕووخێن، دوایـی دیوارەکـانیش بەسەر سـەربانەکەدا کەوتبوون، واش پێدەچێ خەڵکەکەشی هەر فـەوتابێ، دیـارە بەڵایـەکیان بـۆ هـاتوە، ﴿ قَالَ أَنَّىٰ يُحْىِۦ هَٰذِهِ ٱللَّهُ بَعْدَ مَوْتِهَا ﴾، گـوتی: دەبـێ خـوا چۆن ئەمە زینـدوو بکـاتەوە، دوای مردنی ؟ واتـە: خـەڵکی ئـەم وڵاتـە، کـە دیـارە خەڵکەکەشـی لەوێـدابووەو لـە بـەینی خانووەکانـدا کـەوتوە، جـا دیـار نیـە ئـەو کابرایە کێ بووە ؟ دیـارە لـە تەفسـیرەکاندا دەڵێن: عـوزەیر بـووە، بـەڵام هیـچی لەسـەر نیـە لـە سەرچـاوەیەکی متمانــە پێکـراوەوە، چـونکە ئـەو شـتانە نادیـار (غیب)ن‌و نادیـاریش تەنها بە وەحی دەزانرێ، ئەوی دیکـە هەمووی مێژووییە، بـا لە تەورات‌و ئینجیل‌و ئەوانەشدا هاتبێ، کە ئەو مێژووەش بۆ ئێمە جێی دڵنیـایی

نیە، لە قورئانیشدا هەر ئەوەندە دەفەرموێ: پیاوێك بووە بەوێدا ڕۆیشتوەو ئەو دیمەنەی کە بینیوەو سەری سوڕماوە ! خوایە دەبێ چۆن جارێکی دیکە ئەم خەڵکە زیندوو ببێتەوەو، ئەم شارە ئاوەدان ببێتەوە ؟! پێی دوور بووە ﴿ فَأَمَاتَهُ ٱللَّهُ مِاْئَةَ عَامٍ ثُمَّ بَعَثَهُۥ ﴾، خوا بۆ ماوەی سەد ساڵ مراندیو دوایی زیندووی کردەوە ﴿ قَالَ كَمْ لَبِثْتَ ﴾، دیارە لە ڕێی فریشتەکانەوە لێی پرسیوە، خۆ خوا ﷻ بۆخۆی وەحی بۆ نەناردوە لێی بپرسێ، لە ڕێی فریشتەیەکەوە پێیفەرمووە: چەند ماویەوە ؟ ﴿ قَالَ لَبِثْتُ يَوْمًا أَوْ بَعْضَ يَوْمٍ ﴾، گوتی: ڕۆژێك بەتەواویی ماومەوە، لە بەیانییەوە تا ئێوارە خەوتووم، یاخود هەندێك لە ڕۆژێك ﴿ قَالَ بَل لَّبِثْتَ مِاْئَةَ عَامٍ ﴾، فەرمووی: بەڵکو سەد ساڵی ڕەبەق ماویەوە بە مردوویی، ئەو وایزانیوە هەر خەوتوە، نەیزانیوە مردوە ﴿ فَٱنظُرْ إِلَىٰ طَعَامِكَ وَشَرَابِكَ لَمْ يَتَسَنَّهْ ﴾، خوای زاڵی خاوەن شکۆ، دوو شتی دەخاتە بەرچاو:

یەکەم: خواردنو خواردنەوەکەی.

دووەم: گوێ درێژەکەی.

دەفەرموێ: جارێ تەماشای خواردنو خواردنەوەکەت بکە، گۆڕانی بەسەردا نەهاتوە، کە خواردنو خواردنەوە زووتر دەگۆڕێ (نان) کەڕوو دێنێو ڕەق دەبێو لە بەین دەچێ، (ئاو)یش ئەگەر نەشەبێتە هەڵم تێکدەچێ، دەفەرموێ: تەماشای بکە نەگۆڕاوە، جا توێژەرانی قورئان زۆریان باسکردوە: یەك دەڵێ: هەنجیری پێبووە، یەك دەڵێ: گۆشتی پێبووە، یەك دەڵێ خورمای پێبووە، بەڵام ئەو وردەکارییە هیچی قورئان باسی نەکردوە، چونکە پێویست نیە، وەك دوایی باسی دەکەین ﴿ وَٱنظُرْ إِلَىٰ حِمَارِكَ ﴾، خواردنو خواردنەوەکەت هیچی لێنەهاتوە، بەڵام تەماشای کەرەکەت بکە، وا تۆپیوەو لەوێ کەوتوەو ئێسقانەکانی ماونەتەوە ﴿ وَلِنَجْعَلَكَ ءَايَةً لِّلنَّاسِ ﴾، بۆ ئەوەی بتکەینە

بەڵگەو نیشانە بۆ خەڵكی، كە خوا ﷻ دەتوانێ خەڵكی زیندوو بكاتەوە ﴿وَٱنظُرۡ إِلَى ٱلۡعِظَامِ كَيۡفَ نُنشِزُهَا﴾، وە تەماشای ئێسقانەكان بكە، چۆن هەڵیاندەستێنینەوە، پەیكەری ئێسقانەكە پێكەوە دەنوسێنینەوە، ﴿ثُمَّ نَكۡسُوهَا لَحۡمٗا﴾، دوایی تەماشا بكە چۆن گۆشتی دەخەینەوە سەری ﴿فَلَمَّا تَبَيَّنَ لَهُۥ قَالَ أَعۡلَمُ أَنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ﴾، دوای ئەوە ئەوەی وابینی، بۆی ڕوون بۆوە بەچاوی خۆی دیتی، گوتی: ئێستا دەزانم كە خوا بەسەر هەموو شتێكدا بە توانایە.

**بەسەرهاتی سێیەمیان:** كە دەفەرموێ: ﴿وَإِذۡ قَالَ إِبۡرَٰهِـۧمُ رَبِّ أَرِنِي كَيۡفَ تُحۡيِ ٱلۡمَوۡتَىٰ﴾، وە كاتێك ئیبراهیم گوتی: پەروەردگارم پێشانم بدە، چۆن مردووان زیندوو دەكەیەوە، نەیفەرموە: بۆت زیندوو ناكرێتەوە، گوتوویەتی: با چۆنییەتیكەی بزانم، ئیبراهیم ویستوویەتی خوای پەروەردگار چۆنیەتی مردوو زیندووكردنەوەكەی پێشان بدات، دیارە خوا زانیویەتی كە بڕوای هێناوە، بەڵام ویستوویەتی حیكمەتی ئەو داواكردنەی بخاتەڕوو، ﴿قَالَ أَوَلَمۡ تُؤۡمِن﴾،فەرمووی: ئایا ئیمانت نەهێناوە؟ ﴿قَالَ بَلَىٰ﴾، گوتی: با، ئیمانم هێناوە ﴿وَلَٰكِن لِّيَطۡمَئِنَّ قَلۡبِي﴾، ئنجا ئایا حیكمەتەكەی چییەو بۆچی داوا دەكات خوا پێشانی بدات، چۆن مردوو زیندوو دەكاتەوە ؟ بەڵام بۆ ئەوەی دڵم ئارام بگرێ ﴿قَالَ فَخُذۡ أَرۡبَعَةٗ مِّنَ ٱلطَّيۡرِ فَصُرۡهُنَّ إِلَيۡكَ﴾، (خوا) فەرمووی: چوار باڵندان بگرە، چوار باڵندەی جۆراو جۆر {دیسان لێرەشدا توێژەروان زۆریان قسەكردوە لەوبارەوە، بۆ نموونە: یەكێ دەڵێ: طاوسێك و كۆترێكو كەوێكو قەلێك بوون، هەمووی هەر قسەیەو دیارنیە چیوچی بوون گرنگ ئەوەیە چوار باڵندەی جۆراوجۆر بوون} دوایی بەلای خۆتیاندا بێنە، لەوانەیە مەبەستی پێ ئەوە بووبێ دانیان بۆ ڕۆ بكاتو بانگیان بكات بە جۆرێك بیانگرێ، ﴿ثُمَّ ٱجۡعَلۡ عَلَىٰ كُلِّ جَبَلٖ مِّنۡهُنَّ

جُزۡءٗا ﴾، دوایی لەسەر هەر کێوێك پارچەیەکیان لێ فڕێدە، واتە: بیانگرەو سەریان ببڕەو پارچە پارچەیان بکە، دوایی پارچەکان تێکەڵ بکەو، هەر پارچەیەی لەسەر کێوێك دابنێ ﴿ ثُمَّ ٱدۡعُهُنَّ يَأۡتِينَكَ سَعۡيٗا ﴾، دوایی بانگیان بکە بە ڕاکردن، یاخود بە ڕۆیشتنێکی خێرا، دێن بۆ لات ﴿ وَٱعۡلَمۡ أَنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٞ ﴾، وە بزانە کە خوا زاڵەو کاربەجێیە، بالادەستە بەسەر هەموو شتێکدا، وە کاربەجێشە.

## چەند مەسەلەیەکی گرنگ

**مەسەلەی یەکەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ أَلَمۡ تَرَ إِلَى ٱلَّذِي حَآجَّ إِبۡرَٰهِـۧمَ فِي رَبِّهِۦٓ أَنۡ ءَاتَىٰهُ ٱللَّهُ ٱلۡمُلۡكَ ﴾، ئایا سەرنجی ئەو کەسە نادەی کە موناقەشەی کرد، شەڕە قسەی کرد لەگەڵ ئیبراهیمدا، لە حاڵێکدا کە خوا حوکمڕانی کردبوو، دەسەڵاتی دابۆیە، دیارە خوای کاربەجێ دەرینەخستوە، کە ئایا ئەو پادشایە کێ بووە ؟ وە لە کوێ بووە ؟ چونکە وەك جاری دیکەش باسمان کردوە، بەسەرهاتەکانی قورئان خوای زانا ئەو شتانەیان تێدا باس ناکات، کە ئێمە پێویستیمان پێیان نیە، ئایا ئێمە پەکمان لەسەر ئەوە کەوتوە، کە ئەو کابرایە کێ بووە ؟ نەخێر، ئایا پەکمان لەسەر ئەوە کەوتوە لەکوێ بووە ؟ نەخێر، ئایا پەکمان لەسەر ئەوە کەوتوە کەی بووە ؟ نەخێر، بۆچی ؟ چونکە ئامانج لەو بەسەرهاتە ئەوەیە کە دەریبخات ئیمان و خوا بەیەکگرتن بەڵگەی هەیەو، شیرك و کوفر بەڵگەی نیە، ئینسانی بڕوادار بەڵگەی بەدەستەوە هەیە، بەڵگەی ددان شکێن، بەڵگەی ئیقناعکەر، بەڵام ئینسانی بێبڕوا بەڵگەی نیە، ئنجا لە ئەنجامی ئەو وتووێژەدا، ئەو حیکمەت و ئامانجە دەرخراوەو ئەوی دیکەش، وردەکارییەکان، ئێمە پێویستیمان پێیان نیە، وە ئەگەر قورئانیش وردەکارییەکانی باس بکردایە ئێستا چەندە، دەبوو بیست، سی هێندەی دیکە بوایە!!

**مەسەلەی دووەم:** کە ئیبراهیم دەفەرموێ: ﴿ رَبِّيَ ٱلَّذِي يُحۡيِۦ وَيُمِيتُ ﴾ پەروەردگاری من دەژیەنیٚ و دەمرێنیٚ و پادشایەکەش دەڵێ: ﴿ أَنَا۠ أُحۡيِۦ وَأُمِيتُ ﴾ منیش دەژیەنم و دەمرێنم، دوایی ئیبراهیم دەفەرموێ: ﴿ فَإِنَّ ٱللَّهَ يَأۡتِي بِٱلشَّمۡسِ مِنَ ٱلۡمَشۡرِقِ فَأۡتِ بِهَا مِنَ ٱلۡمَغۡرِبِ ﴾ پەروەردگارم لە ڕۆژهەڵاتەوە خۆر دێنیٚ، تۆ لە ڕۆژئاواوە بیهێنە، هەندێك لە زانایان گوتوویانە: کە ئیبراهیم بەڵگەی هێناوەتەوەو ئەو پادشایە تانەی لێداوە، ئیبراهیم گواستوویەتەوە بۆ بەڵگەیەکی دیکە، بەڵام باشتر لەوە ئەوەیە کە زانایانی دیکە گوتوویانە:

کە ئەوە هەر یەك بەڵگەیە، بەڵام ئەوە کە لە تەعبیری یەکەمدا هێناویەتەوە، کە بەڵگەکە بریتیە لەوەی ئەوەی بە پەروەردگارم دەکرێ بە تۆ ناکرێ، دوای ئەوەی ئەمەیان تەشویشێکی لەسەر پەیداکردوە، بۆی گواستۆتەوە بۆ شێوازێکی دیکە، کە ئەویش هەر باسی تەصەڕڕوفی پەروەردگارە، چونکە پەروەردگار دەبیٚ تەصەڕڕوف لە موڵکدا بکات، جا هی یەکەمی کە بۆ هێناوەتەوە کە تەصەڕڕوفکردنی خوایە بە مراندن و ژیاندن و، تەشویشێکی لەوێدا لیٚ پەیدا کردوە، ئنجا شتێکی دیکەی گەورەتری بۆ هێناوەتەوە، کە نەتوانیٚ تەشویشی تێدا پەیدابکات، کە بریتیە لە تەصەڕڕوفکردنی خوا لە ئاسۆیەکاندا، لە بوونەوەردا، کە ئەویش گواستنەوەی خۆرە لە ڕۆژهەڵاتەوە بۆ ڕۆژئاواو، هەموو ڕۆژیٚ بە بەردەوامیی، دەجا با ئەو کابرایە جارێك لە جاران پێچەوانەی ئەوە بیخولێنێتەوە !

**مەسەلەی سێیەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ فَبُهِتَ ٱلَّذِي كَفَرَ ﴾، لە ڕاستیدا ئەوە حەقیقەتێکی عەقیدەیی دەخاتەڕوو، کە هەمیشە ئەوەی بێبڕوایە لە بەرانبەر ئەوەدا کە ئیماندارە، بەمەرجێك ئیماندارەکە شارەزابیٚ و لە ئاستی پێویستدا بیٚ، هەمیشە بیٚبەڵگەیەو دەستەوستانە، وە دەمی دەبێتە تەڵەی تەقیوو هەردەم تێشکاوو بەزیوە.

**مەسەلەی چوارەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ أَوْ كَالَّذِى مَرَّ عَلَىٰ قَرْيَةٍ وَهِىَ خَاوِيَةٌ عَلَىٰ عُرُوشِهَا ﴾، دیسان خوای پەروەردگار دەرینەخستوە، ئەو کەسە کێ بووە؟ مسولمان بووە، یان نامسولمان؟ پێغەمبەر بووە، یان پێغەمبەر نەبووە؟ لە کوێ بووە؟ کەی بووە؟ هیچی دەرنەخستوە، بەڵێ، توێژەرەوان و مێژوونووسان قسەیان لێکردوە، یەك دەڵێ: عوزەیر بووە، یەك دەڵێ: کەسێکی دیکە بووە، یەك دەڵێ: پێغەمبەر بووەو وەحی بۆ هاتوە، یەك دەڵێ: پێغەمبەر نەبووە، یەك دەڵێ: کافر بووە، یەك دەڵێ: مسولمان بووە، بەلام ئێمە پێویستیمان بەو وردەکارییانە هیچی نیە، چونکە ئەوەی کە گرنگە ئامانجی بەسەرهاتەکەیە، ئەویش ئەوەیە کە خوای زاناو توانا پێشانی ئەو ئینسانەی داوەو، بەسەرهاتەکەی بۆ ئێمە گێڕاوەتەوە، ئەگەرنا خۆ کەس لەوێ نەبووە، تاکو ئەوەی بۆ بگێڕێتەوە کە ڕوویداوە، ئامانجەکەش ئەوەیە کە خوا ﷻ هەر لە دنیادا ئەوەی کە لە قیامەتدا دێتەدی، هێناویەتە دی بەسەر ئەو تاکەدا، وە لە ئایەتەکانی پێشووتریش هێنامانەوە، کە هەزاران کەس لە شارەو ئاوەدانییەك دابوون و لە ترسی مردن بەجێیان هێشت، کەچی خوای پەروەردگار مراندنی و دوایی زیندووشی کردنەوە، کەواتە: ئەوەی کە لە قیامەتدا ڕوو دەدات، خوا لە دنیادا چەند وێنەیەکی لێ هێناوەتە دی، هاوەڵانی ئەشکەوتیش سێ سەدو نۆ ساڵ خەوتوون، دواییش خوای ژیێنەرەوە خەبەری کردوونەتەوە، ئەوەش هەمووی بۆ ئەوەیە کە بەشەر مەسەلەی زیندووکردنەوەی قیامەتی لەلا ئاسایی بێ و ئیمانی پێ بهێنێ.

**مەسەلەی پێنجەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ فَأَمَاتَهُ ٱللَّهُ مِاْئَةَ عَامٍ ثُمَّ بَعَثَهُۥ ﴾، هەندێك لە توێژەرەوان بۆ وێنە: (محمد رشید رضا) کە زانایەکی زۆر گەورەیەو تەفسیرەکەشی شتی زۆر باشی تێدایە، گوتوویەتی[1]: لێرەدا مەبەست لە: ﴿ فَأَمَاتَهُ ﴾، یانی: (فَأَنَامَهُ) خەواندوویەتی، خەوی لێ خستوە، بەلام بێگومان

---

١) (تفسیر القرآن الحكیم، تفسیر المنار، ج: (٣)، ص: (٥٠).

ئەوە تەکەللوفە، چونکە خوا بە دەقی ئایەت فەرموویەتی: مراندوویەتی (فَأَمَاتَهُ) بۆیە پێویست ناکات بەبێ بەڵگەو پاساو لە مانا ڕواڵەتییەکەی لابدرێ‌و گوتراویشە: (لکلِّ عالمٍ هفوة، ولكل جوادٍ كبوة، ولكلِّ حُسامٍ نَبْوَةٌ)، واتە: هەموو زانایەك هەڵەیەکی دەبێ‌و، هەموو ئەسپێکی باش ڕەتەڵێك (ساتمەیەك) دەباو، هەموو شمشێرێکی باش وادەبێ نەبڕێ.

**مەسەلەی شەشەم:** کە دەفەرموێ: ﴿وَٱنظُرۡ إِلَىٰ حِمَارِكَ وَلِنَجۡعَلَكَ ءَايَةٗ لِّلنَّاسِ﴾، تەماشای کەرەکەت بکە وە بۆ ئەوەی بتکەینە نیشانەو بەڵگە بۆ خەڵك، شێخ موحەممەد عەبدەش لە تەفسیرەکەیدا دەڵێ: گوێدرێژەکە نەمردوە، بەڵکو کە دەفەرموێ: ﴿وَٱنظُرۡ إِلَىٰ حِمَارِكَ﴾، واتە: تەماشای بکە خوا چۆنی دروست کردوە، تەماشای پێکهاتەی گوێدرێژەکەت بکە، پەیکەری ئێسقانەو گۆشتەو پێستە[1]، بەلام بەڕاستی قسەکەی بەجێ نیە، چونکە خوای زیندووکەرەوە، دەفەرموێ: ﴿وَٱنظُرۡ إِلَى ٱلۡعِظَامِ كَيۡفَ نُنشِزُهَا﴾، تەماشای ئێسقانەکان بکە، چۆن هەڵیاندەستێنینەوە ﴿ثُمَّ نَكۡسُوهَا لَحۡمٗا﴾، دوایی چۆن بە گۆشت دایدەپۆشین ! بەلام شێخ موحەممەد عەبدە گوتوویەتی: تەماشای بکە چۆن پەیکەری ئێسقانەکانمان دروست کردوەو، دوایی بە گۆشت دامانپۆشیوە ! بەلام ئەوە تەکەللوفێکی دوورە، دیارە شێخ موحەممەد عەبدەو هەندێکی دیکە لەو زانایانەی ئەو کاتی، ویستوویانە ئایەتەکان بە جۆرێك تەفسیر بکەن کە لەگەڵ ئەوەی پێی دەگوترێ: زانستی، تێك نەگیرێ، بچێتە عەقڵی خەڵکەوە، بەلام زۆر جار تەکەللوفێکی زۆر لە قسەکانیاندا هەیەو پێچەوانەی ڕواڵەتی ئایەتەکانە، وە هیچ پێویستیشمان بەوە نیە، چونکە ئەوەی ئیمانداربێ بڕوای بە خوا ﷻ هەبێ، بڕواشی بەوە هەیە کە خوای زاناو توانا هەموو شتێکی پێ دەکرێ، ئیدی پێویست ناکات ئێمە ئایەتەکان بگۆڕین، بۆ ئەوەی بچێتە عەقڵی هەندێ کەسەوە.

---

١) (تفسير القرآن الحكيم، تفسير المنار، ج: (٣)، ص: (٥١).

**مەسەلەی حەوتەم:** کە ئیبراهیم ﷺ ئەو داوایە لە خوا ﷻ دەکات: ﴿وَإِذۡ قَالَ إِبۡرَٰهِـۧمُ رَبِّ أَرِنِي كَيۡفَ تُحۡيِ ٱلۡمَوۡتَىٰ﴾، وە کاتێك ئیبراهیم ﷺ بە پەروەردگاری فەرموو: پەروەردگارم پێشانم بدە چۆن مردووان زیندوو دەکەیەوە، لێرەدا ئیبراهیم ﷺ نەیگوتوە: پێت زیندوو ناکرێتەوە، گوتوویەتی: چۆنیەتییەکەم پێشان بدە، وەك یەکێك دێ بۆ لای تۆ دەڵێ: من کتێبێکم داناوە، تۆش پێی دەڵێی زەحمەت نەبێ بۆم ڕوون بکەوە چۆنت داناوە، مانای وانیە تۆ گومانت هەیە لەوەی کە کتێبەکەی نووسیوە، (ئیبراهیم)یش لێرەدا لەبارەی چۆنیەتی مردوو زیندووکردنەوەوە، لە خوا داوا دەکات شتێکی پێشان بدا، ئەویش بۆچی ؟ دوای ئەوەی خوای پەروەردگار لێی دەپرسێ: ﴿أَوَلَمۡ تُؤۡمِن ؟﴾، ئەدی ئیمانت نەهێناوە ؟ بۆچی خوای بێهاوتا ئەو پرسیارەی لێدەکات ؟ ئایا خوای بەرزو مەزن نازانێ کە ئیمانی هەیە ؟ با، بەڵام بۆیە ئەو پرسیارەی لێدەکات، تاکو ئیبراهیم وەڵامێك بداتەوە، حیکمەتی داواکارییەکەی خۆی بخاتەڕوو کە ئیبراهیم مەبەستی چییەو بۆچی ئەو داوایە لە خوا ﷻ دەکات ؟! بەڵێ حیکمەتو هۆکاری پرسیارکردنەکەی خوای کاربەجێ لە ئیبراهیم ئەوەیە کە گوتمانو، لەبەر ئەوە نیە کە خوا پەنهانزان گومانی هەبێ، چونکە خوا زانای پەنهانو ئاشکرایەو گومانی نەبووە لەوەدا کە ئیبراهیم گومانی نیەو، مەبەستی پرسیارەکە ڕوون کردنەوەی حیکمەتی داواکارییەکەی ئیبراهیمی خەلیلی خوایە ﷻ.

**مەسەلەی هەشتەم:** کاتێك ئیبراهیم دەڵێ: ﴿بَلَىٰ وَلَٰكِن لِّيَطۡمَئِنَّ قَلۡبِي﴾، با، ئیمانم هەیە، بەڵام بۆ ئەوەی دڵم ئارام بگرێ، ئایا ئیبراهیم ﷺ دڵی ئارام نەبووە ؟ با، بەڵام زانایان دەڵێن: ئیبراهیم ﷺ ویستوویەتی ئەو دڵ ئارامییەی کە بەهۆی (علم الیقین)ەوە بۆی پەیدا بووە، {(علم الیقین) واتە: تۆ زانیارییەکی جێی دڵنیاییو تەواوت هەیە دەربارەی شتێك} ویستوویەتی جۆرێکی دیکەش لە دڵ ئارامیی بۆبێ، کە پێی دەگوترێ: (عین الیقین) واتە: بە

چاوی خۆی ببینێ، بە عەقڵ‌و عیلم دڵنیا بووە، كە خوا مردووان زیندوو دەكاتەوە، بەڵام ویستوویەتی بەچاوی خۆی چۆنیەتییەكەی ببینێ، جا لێرەدایە كە پێغەمبەری خۆمان موحەممەد ﷺ فەرموویەتی: {(نَحْنُ أَحَقُّ بالشَكِّ مِنْ إبرَاهِيمَ، إذْ قَالَ: ﴿ رَبِّ أَرِنِي كَيْفَ تُحْيِ ٱلْمَوْتَىٰ ﴾) (رَوَاهُ البُخَارِيُّ برقم: (٣٣٧٢)، وَمسلم برقم: (٣٨٠) عَنْ أبي هُرَيرَةَ رضي الله عنه}، واتە: ئێمە شایستەترین بە گومان لە ئیبراهیم عليه السلام كە گوتی: پەروەردگارم پێشانم بدە چۆن مردووان زیندوو دەكەیەوە، واتە: ئیبراهیم نەكەوتۆتە گومانەوەو، ئەگەر ئێمە بكەوینە گومانەوە ئیبراهیم نەكەوتۆتە گومانەوە، كاتێك ئەو داواكارییەی كردوە، بەڵكو حیكمەتەكەی ئەوە بووە كە وەك گوتوویەتی: بۆ ئەوەی دڵم زیاتر ئارام بگرێ، ئیمانی هەبووەو ویستوویەتی ئیمانی زیاتربێ، جا ئەمە چی لێوەردەگیرێ ؟ ئەوەی لێوەردەگیرێ كە ئیماندارو مسوڵمان دەبێ هەمیشە هەوڵدا عیلمی زیاتر پەیدا بكات، بۆ ئەوەی یەقینی زیاتری هەبێ، با شارەزایی زیاترت هەبێ بۆ ئەوەی ئیمانت پتەوتربێ، نابێ بە كەم قەناعەت بكەی، ئیبراهیم عليه السلام خەلیلی خوا بوو تعالى وەك دەفەرموێ: ﴿ ... وَٱتَّخَذَ ٱللَّهُ إِبْرَٰهِيمَ خَلِيلًا ﴿١٢٥﴾ ﴾النساء، وە خوا ئیبراهیمی كردوە دۆستی نیزیكی خۆی، هەروەها ئیبراهیم پێغەمبەری خوا بووە، جا دەبێ چ ئیمانێكی بووبێ ! كەچی بەو ئەندازە ئیمانەی كە هەیبووە، قەناعەتی نەكردوەو، ویستوویەتی ئیمانەكەی زیاترو چاكتریش‌و دامەزراوتریش بێ.

**مەسەلەی نۆیەم:** كە دەفەرموێ: ﴿ قَالَ فَخُذْ أَرْبَعَةً مِّنَ ٱلطَّيْرِ فَصُرْهُنَّ إِلَيْكَ ﴾، (خوا) فەرمووی: چوار باڵندان بگرەو بەلای خۆتیاندا بێنە، واتە: بیانگرە یاخود كەوییان بكە،ماڵییان بكە، هەندێك لە توێژەرەوان وایان لێكداوەتەوە، واتە: ماڵییان بكە، با پێت ئاشنابن، جا دوایی بیانگرە، پاشان سەریان ببڕەو پارچە پارچەیان بكە، وە هەر پارچەی لەسەر كێوێك فڕێ بدە، دوایی بانگیان بكە بە ڕۆیشتنێكی خێرا دێن بۆ لات، لێرەدا (أبو مسلم الأصفهاني) ئاوای

لێكداوەتەوە، گوتوویەتی: مەبەستی ئەوەبووە ئەو باڵندانە كەوی بكەو وەرەی خۆتیان بكەو، بەخۆتیان ئاشنا بكە، دوایی هەریەكەیان لە شوێنێك دابنێ، دوایی بانگیان بكە دێنەوە بۆ لات، بەڵام ئایەتەكە دەفەرموێ: ﴿ ثُمَّ ٱجْعَلْ عَلَىٰ كُلِّ جَبَلٍ مِّنْهُنَّ جُزْءًا ﴾، پاشان هەر پارچەیان بخەرە سەر كێوێكو نەیفەرمووە: هەر یەكەیان، هەروەها (ڕەشید ڕەزا)ش لێی خواستۆتەوەو ئەویش دەڵێ[1]: مەبەستی ئەوەیە كە هەر باڵندەیەك لەسەر كێوێك دابنێو دوایی بانگیان بكە ! دیارە ئەوە جۆرە تەفسیرەش هەر ئەوە بووە كە لە عەقڵی هەندێ خەڵك نزیك بخرێتەوە، كە پێیان وایە زەحمەتە پارچە پارچە ببنو خوا لێكیان نزیك بخاتەوە ! بەڵام بۆ خوای باڵادەست زۆر ئاساییە، پێشتر گەردیلەكانیان هەریەكە لە شوێنێكی بووەو، خوای پەروەردگار كۆی كردوونەتەوەو خانەو شانەی لێ پێكهێناونو، دوایی ئەو ئەندامانەیان لێ پێكهاتوون، كە باڵندەكەیان لێ پێكهاتوە، ئێستاش ئەگەر پارچە پارچە ببن، بۆ خوای باڵادەست زۆر ئاسنە كە زیندوویان بكاتەوەو دروستكردنی یەكەمجار قورستر بووە[2]، بۆیە بۆ ئینسانی ئیماندار هیچ كاتێك جێی ئیشكال نیەو كەسێك بڕوای بە توانای بێسنووری خوای پەروەردگار هەبێ، ئیمانهێنانی بە زیندووكردنەوەی مردووان لەلایەن خواوە شتێكی بێ ئیشكالە، خوای پەروەردگار لەو كەسانەمان بگێڕێ كە ئیمانی پتەوو دامەزراویان هەیە، وە خوای بە بەزەیی هۆكارەكانی دامەزراویی و پتەوبوونی ئیمانمان زیاتر بۆ بڕەخسێنێ، آمین.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

---

١) (تفسیر القرآن الحكیم، تفسیر المنار، ج: (٣)، ص: (٥٣ - ٥٨).

٢) واتە: بەلای ئێمەوە، ئەگەرنا بۆ خوا ﷻ قورسو قورستر، یان قورسوسووك نیەو هەموو شتێك بۆ خوا ئاسانو سووكە.

# دەرسی پەنجاو چوارەمین

## پێناسەی ئەم دەرسە

لەم دەرسەماندا خوای پەروەردگار پشتیوان بێت، پێنج ئایەت لە سووڕەتی (البقرة) دەتوێژینەوە، کە بریتین لە ئایەتەکانی ژمارە: (٢٦٢ تاکو ٢٦٦)، لەم پێنج ئایەتەدا خوا ﷻ دەربارەی یەك بابەت بۆمان دەدوێ، کە بریتیە لە چاکەکردنو ماڵ بەخشین، وە هاندانی مسوڵمانان بۆ بەخشین هاندانیان لەسەر ئەوە، کە ئەدەبە بەرزەکانی ماڵ بەخشین لە خۆیاندا بێننەدی، وە خۆپاراستن لە منەتکردنو ئازاردانی دڵی کەسێك کە هاوکاریی دەکەنو پاشان سەرەنجامی شوومی منەتکردنو ڕیابازیی لە بواری چاکەکاریی و بەخشین داو، سەرەنجامی چاكو پەسندی ماڵو سامان بەخشینی ساغو دڵسۆزانەو خواپەسندانە، لە ڕۆژی دوایدا دەخاتە ڕوو، لە میانی هێنانەوەی دوو سێ وێنەی زۆر کاریگەردا.

﴿ مَّثَلُ ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمْوَٰلَهُمْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ كَمَثَلِ حَبَّةٍ أَنۢبَتَتْ سَبْعَ سَنَابِلَ فِي كُلِّ سُنۢبُلَةٖ مِّاْئَةُ حَبَّةٖۗ وَٱللَّهُ يُضَٰعِفُ لِمَن يَشَآءُۚ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ ﴿٢٦١﴾ ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمْوَٰلَهُمْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ثُمَّ لَا يُتْبِعُونَ مَآ أَنفَقُواْ مَنّٗا وَلَآ أَذٗى لَّهُمْ أَجْرُهُمْ عِندَ رَبِّهِمْ وَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿٢٦٢﴾ ۞قَوْلٞ مَّعْرُوفٞ وَمَغْفِرَةٌ خَيْرٞ مِّن صَدَقَةٖ يَتْبَعُهَآ أَذٗىۗ وَٱللَّهُ غَنِيٌّ حَلِيمٞ ﴿٢٦٣﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تُبْطِلُواْ صَدَقَٰتِكُم بِٱلْمَنِّ وَٱلْأَذَىٰ كَٱلَّذِي يُنفِقُ مَالَهُۥ رِئَآءَ ٱلنَّاسِ وَلَا يُؤْمِنُ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْأٓخِرِۖ فَمَثَلُهُۥ كَمَثَلِ صَفْوَانٍ عَلَيْهِ تُرَابٞ فَأَصَابَهُۥ وَابِلٞ فَتَرَكَهُۥ صَلْدٗاۖ لَّا يَقْدِرُونَ عَلَىٰ شَيْءٖ مِّمَّا كَسَبُواْۗ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِي ٱلْقَوْمَ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٢٦٤﴾ وَمَثَلُ ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمْوَٰلَهُمُ ٱبْتِغَآءَ مَرْضَاتِ ٱللَّهِ وَتَثْبِيتٗا مِّنْ أَنفُسِهِمْ

كَمَثَلِ جَنَّةٍ بِرَبْوَةٍ أَصَابَهَا وَابِلٌ فَـَٔاتَتْ أُكُلَهَا ضِعْفَيْنِ فَإِن لَّمْ يُصِبْهَا وَابِلٌ فَطَلٌّ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴿٢٦٥﴾ أَيَوَدُّ أَحَدُكُمْ أَن تَكُونَ لَهُۥ جَنَّةٌ مِّن نَّخِيلٍ وَأَعْنَابٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ لَهُۥ فِيهَا مِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِ وَأَصَابَهُ ٱلْكِبَرُ وَلَهُۥ ذُرِّيَّةٌ ضُعَفَآءُ فَأَصَابَهَآ إِعْصَارٌ فِيهِ نَارٌ فَٱحْتَرَقَتْ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمُ ٱلْءَايَٰتِ لَعَلَّكُمْ تَتَفَكَّرُونَ ﴿٢٦٦﴾ ﴾.

## مانـای وشـه به وشـەی ئایەتەکـان

((وێنـەی ئەوانەی کە سامانەکانیان لەپێنـاو خـوادا خـەرج دەکـەن، وەك وێنـەی دەنکێك وایـە کە حەوت گوڵان دەڕوێنـێ، هەر گوڵێـك سـەد دەنکی تێدایـە، وە خـوا بـۆ هەرکەسێك بیـەوێ پاداشـت چـەند قـات دەکـاتەوە، وە خـوا سیفەت فراوانـی زانایە ﴿٢٦١﴾ ئەوانەی سـامانەکانیان لەڕێـی خـوادا خـەرج دەکـەن پاشـان هـیچ جـۆرە منـەتکردن‌و ئازاردانێـك بـەدوای ئـەوە ناخـەن کـە خـەرجیان کـردوە، لـەلای پەروەردگاریان پاداشتی خۆیانیان هەیەو، هیچ جۆرە ترسێکیان نابێ‌و خەمباریش نـابن ﴿٢٦٢﴾ قسەیەکی بـاش‌و لێبوردنێـك (لەگـەڵ بابـای ئاتاجـدا) لـە خێرکردنێـك باشـترە کە ئازاردانی بەدوا دابێ، وە خـوا بـێ نیـازە، هێـدیی یـە ﴿٢٦٣﴾ ئـەی ئەوانـەی بڕواتان هێناوە خێرو چاکەکانتان بەهۆی منەتکردن‌و ئـازاردانەوە، هەڵمەوەشێننەوە، وەك بابایەك کە سامانەکەی بۆ ڕووپامایی خەڵکی خەرج دەکات‌و بڕوای بـە خـواو بە ڕۆژی دوایـی نیـە، جا وێنـەی ئەوە وەك وێنـەی تـاتـە بـەردێك وایـە کـە تەنکە گڵێکی لەسەرە، بارانێکی دڵۆپە قورس لێی دەدات‌و بـەڕەق‌و تـەقی دەیخاتـە گـۆڕێ، (وە سەرەنجام ئەو جۆرە ماڵخەرجکەرانە لە ڕۆژی دواییـدا) هیچیان دەستگیـر نابێ لە بەرهەمی ئەوەی کردوویانە، وە خوا ڕێنمایی کۆمەڵی بێبڕوایـان ناکـات ﴿٢٦٤﴾ وە وێنەی ئەوانە کە سامانەکانیان بۆ بەدەستهێنانی ڕەزامەندیی خواو چەسپاوکردنیان (لەسەر مسوڵمانەتیی) خەرج دەکەن، وەك وێنەی باغێك وایـە لە بەرزاییـەك، کە

بارانێکی دڵۆپە قورسی لێدەبارێو، بەرهەمەکەی دوو قات دەدات، وە ئەگەر بارانی دڵۆپە قورسیشی لێنەبارێ وردەبارانێك (ی بەسە)، وە خوا بینەری ئەوەیە کە دەیکەن ﴿٢٦٥﴾ ئایا هیچ کامێکتان حەز دەکات کە باغێکی لە خورماو ترێی هەبێ، شا جۆگەی بەژێردا بڕۆن، لە هەموو جۆرە میوەیەکی لەوێدا هەبێ، وە چووبێتە قۆناغی پیرییەوەو بەساڵدا چووبێ، وە منداڵی وردیشی هەبن، ئیدی (کتوپڕ) گێژەڵووکەیەك کە گڕی ئاگری تێدایە، لێی بداو بسووتێ ؟! ئاوا خوا ئایەتەکانیان بۆ ڕوون دەکاتەوە بەڵکو بیر بکەنەوە ﴿٢٦٦﴾)).

## شیکردنەوەی هەندێك لە وشەکان

(**حَبَّةٍ**)؛ واتە: دەنك، (يُقَالُ فِي الحِنْطَة والشَعِير ونَحْوِهِمَا)، (حَبٌّ و حبَّةٌ) بۆ دەنکی گەنمو جۆو وێنەی ئەوانە دەگوترێ.

(**سَنَابِلَ**)؛ (السَنَابِل جَمْعُ سَنبُلَة وجَمْعُ سنبل)، (سنابل) کۆی (سُنْبُلَة)و (سُنْبِلَ)ە، واتە: گوڵە گەنم، گوڵە جۆ، گوڵە مەرەزە، گوڵە هەرزن، ئەوەی کە بەرپیز دەنکەکانی تێدایە.

(**يُضَاعِفُ**)؛ واتە: چەند بەرانبەر دەکاتەوە، چەند قات دەکاتەوە، (أضْعَفْتُ الشَّيءَ، وَضَعَّفْتُه، وَضَاعَفْتهُ، ضَمَمْتُ إليهِ مِثْلَهُ فَصَاعِداً) هەرسێکیان واتە: وێنەی خۆی، یان چەند وێنەیەکی خۆیم خستە گەڵی، واتە: بەرانبەرم کردەوە، یان چەند بەرانبەرم کردەوە.

(**مَنًّا**)؛ (الْمَنُّ: مَا يُوزَن بِهِ) ئەو شتەیە شتی پێ دەکێشرێ (مَنّ، مَنَّان، أَمْنَان)، (مَنَّان) دوو مەن (أَمْنَان) کۆی (مەن)ە، (والمِنَّة: النِّعْمَة الثَقِيلَة) واتە: (منَّة) نیعمەتێکی قورسە، ئنجا ئایا بۆچی نیعمەتو چاکە پێی گوتراوە: منەت؟ چونکە مادام مەن (مَنْ) ئەو پێوەرەیە کە شتی پێ دەکێشرێو شتی قورسی پێ دەکێشرێ، چاکەش قورسە، وەك بڵێی بەوە کێشرابێ، جا منەت واتە: چاکەو نیعمەت، دیارە ئەگەر بە کردەوە بکرێ باشە، بەڵام ئەگەر بەزار

بگوترێ خراپە ﴿... قُل لَّا تَمُنُّواْ عَلَيَّ إِسۡلَٰمَكُم ...١٧﴾ الحجرات، واتە: بڵێ ئیسلامەتییەکەی خۆتانم لەسەر مەکەنە منەت، چونکە ئەوان بە قسە گوتوویانە، ئەگەرنا بە کردەوە چاکە بکەی زۆر چاکە، چونکە خوای بە بەزەیی دەفەرموێ: ﴿لَقَدۡ مَنَّ ٱللَّهُ عَلَى ٱلۡمُؤۡمِنِينَ إِذۡ بَعَثَ فِيهِمۡ رَسُولٗا مِّنۡ أَنفُسِهِمۡ ...١٦٤﴾ آل عمران، واتە: خوا چاکەی لەگەڵ بڕواداران کرد، کە لە خۆیان ڕەوانەکراوێکی بۆ ناردن، جا تۆ چاکە لەگەڵ کەسێ بکەی بە کردەوە ئەوە باشە، بەڵام بە قسە بەچاوی دابدەیەوە، یاخود باسی بکەی ئەوە خراپە، بۆیە عەرەب گوتوویانە: (الـمِنَّـةُ تَهْدِمُ الصَّنِيعة)، واتە: منەتکردن لەسەر کەسێ کە چاکەت لەگەڵدا کردوە چاکەکەت لە بەیندا دەبات و دەیشواتەوە.

(صَدَقَةٍ): واتە: بەخشین، خێر، چاکە، وە جاری وایە بە مانای زەکاتیش دێ، دەڵێ: (الصَدَقَةُ: مَا يُخرِجُهُ الأنْسانُ مِنْ مَالِهِ عَلَى وَجْهِ القُرْبَةِ كَالزَّكَاةِ) بریتیە لەوماڵەی کە ئینسان بەو شێوەیە کە لە خوا نیزیکی بخاتەوە، بیبەخشی بۆ وێنە: زەکات، بەڵام صەدەقە زیاتر بۆ ماڵێکە کە خۆبەخشانە ببەخشرێ و زەکات واجبە، بەڵام وشەی صەدەقە لە قورئاندا بە مانای زەکاتیش هاتوە: ﴿إِنَّمَا ٱلصَّدَقَٰتُ لِلۡفُقَرَآءِ وَٱلۡمَسَٰكِينِ ...٦٠﴾ التوبة، کە لێرەدا مەبەست پێی زەکاتە.

(تُبۡطِلُواْ): (الإبْطَال: إذْهَابُ الشَيءِ وإزَالَتُهُ) ﴿لَا تُبۡطِلُواْ﴾، واتە: لە بەین مەبەن، هەڵمەوەشێننەوە، دەڵێ: (إبْطَالُ) بریتیە لە بەتاڵکردنەوەی شتێک و لابردنی و نەهێشتنی.

(رِئَآءَ ٱلنَّاسِ): واتە: ڕووپامایی بۆ خەڵکی، (أي مُراءاة وَتَشَبُّعاً) واتە: شتێك کە لەخۆتدا بیهێنیەدی و لە خۆتیدا پێشان بدەی، بۆ ئەوەی خەڵك بیبینێ، جا جاری وایە کابرا ڕووپامایی دەکات، واتە: چاکەیەك خێرێك دەکات دەڵێ: ئەوەم کرد بۆ ئەوەی خەڵك باسی بکات و بیزانێ، وە جاری وا هەیە

چاکەکەی هەر نەشکردوە، کەچی بە درۆ باسی دەکات، کە ئەوە هەر زۆر خراپترە، وەك خوا دەفەرمویّ: ﴿... وَّيُحِبُّونَ أَن يُحۡمَدُواْ بِمَا لَمۡ يَفۡعَلُواْ ...﴿١٨٨﴾﴾ آل عمران، واتە: دەیانەویّ ستایش بکریّن بە شتیّك کە نەیانکردوە.

(صَفۡوَانٍ): واتە: تاتە بەردیّکی لووس، دەڵیّ: (صَفَا صَفۡواً خَلُصَ مِنَ الكَدَرِ) (صَفَا) لیّڵیی پیّوەنەما (والصَّفَاةُ: الحجر العريض الأملس والصَّفْوَان: الصَّخر الأملس) (الصَّفَاةُ والصَّفْوَان): یانی: بەردیّکی پانی لووس.

(وَابِلٌ): واتە: بارانی دڵۆپە گەورە (الوَابْلُ والوَبِلُ: المَطَرُ الثَقِيلُ القِطَار)، واتە: بارانیّکی دڵۆپە قورس (قِطَار) کۆی (قَطْرَة)ە، یانی: دڵۆپە.

(صَلۡدًا): (أي حَجَرَاً صُلْبَاً وهُوَ لايُنْبِتُ)، (صَلْداً): واتە: بەردیّکی ڕەق کە هیچ سەوز ناکات، سەدجار دەغڵودان لەسەر بەرد ڕۆکەی، هیچی لەسەر سەوز نابیّ.

(وَتَثۡبِيتًا): واتە: چەسپاندن، چونکە: (الثَّبَاتُ: ضِدُّ الزَّوَال) واتە: چەسپاویی (ثَبَات) پێچەوانەی لاچوون (زوال)ە، (وثَبَّتُّهُ أي: قَوَّيْتُهُ)، (وثَبَّتُّهُ) واتە: بەهیّزم کردو چەسپاندم.

(بِرَبۡوَةٍ): (رَبوَة) واتە: تەپۆڵکە شویّنیّکی بەرز، دەڵیّ: (رَبَا الشَّيءُ يربو، رَبْواً: نَمَا وَزَادَ) (رَبَا): واتە: گەشەی کرد وە زیادی کرد، ئنجا بۆچی گردۆڵکەو شویّنی بەرز پیّی دەگوتریّ: (رَبْوَة)؟ چونکە لە ئاستی زەوی بەرزترە (والرَّبوَة والرابية: ما ارتفع مِن الأرض)، (ربوَة) و (رابية) ئەوەیە کە لە ئاستی زەوی بەرزترە.

(فَطَلٌّ): (الطَّلُّ: أَضْعَفُ المَطَر، وَهُوَ مَالَهُ أَثَرٌ قَلِيلٌ)، (طَلٌّ) واتە: بارانیّکی نەرم، لە کوردەوارییدا دەڵیّن: (نمە باران) بارانیّکی کەم کە شویّنەوارەکەشی کەمە، وە دەگوتریّ: (وطُلَّ الأرضُ، فَهِيَ مَطْلُولَةٌ) واتە: زەوییەکە ئاوڕشیّن کرا.

(أَيَوَدُّ أَحَدُكُمْ): (أيود) واتە: ئایا یەكێكتان حەز دەكات، (الوُدُّ: مَحَبَّة الشَيء وَتَمَنِّي كَوْنِهِ، وَالتَمَنِّي، هُوَ تَشَهِّي حصولُ ما تَوَدُّهُ)، (وَدّ): بریتیە لەوەی كە تۆ شتێكت خۆشبوێ‌و پێت خۆشبێ بۆت پەیدابێ، وە (تَمَنّي) یانی: خۆزگە خواستن، بریتیە لەوە كە حەز لە پەیدابوونی شتێك بكەی.

(ٱلْكِبَرُ): واتە: بەساڵداچوون پیربوون (يُقَالُ: فُلانٌ كَبِيرٌ، أي: مُسِنٌ) دەگوترێ: فلان كەس گەورەیە، یانی بەتەمەنە (وَأَصَابَهُ الكِبَرُ) واتە: بەساڵداچوو، تەمەنی هاتۆتە سەرێ‌و هەڵكشیدە.

(ذُرِّيَّةٌ): (الذُّرِّيَةُ أَصْلُهَا نَسلُ الرَّجُل وقِيلَ: الصِّغَار من الأولاَد) (ذرية): لە بنەچەدا بەمانای وەچەی پیاو دێ، هەندێكیش دەڵێن: منداڵی گچكەی ئینسان پێی دەگوترێ: (ذرية)، بەڵام بەپێی عورفو باو وشەی: (ذرية) بۆ گەورەو بۆ گچكە بەكاردێ، واتە: بەتەمەن بن، یان كەم تەمەن بن.

(ضُعَفَآءُ): واتە: بێ هێزەكان، وەچەیەكی بێهێز كە لێرەدا مەبەست منداڵی بچووكە، منداڵی بچووك بێهێزەو بەرگریی بۆ لەخۆی ناكرێ‌و خۆی پێ بەرێوەناچێ.

(إِعْصَارٌ): واتە: گەردەلوول، گێژەڵووكە، دەڵێ: (العَصْرُ: مَصْدَرُ عَصَرْتُ والمَعْصُور الشَيء، والمَعْصُورُ والعُصَارَة: نِفَاية مَا يُعْصَرُ، والإعصارُ: رِيحٌ كَثِيرُ الغُبَار) (إعصار): بە بایەك دەگوترێ كە زۆر تۆزو خۆڵی تێدابێ، وە ئەسڵی وشەكە لە (عَصْر)ەوە هاتوە، (عَصْر) واتە: گوشین (عَصَرْت) واتە: ئەو شتەم گوشی (والمَعْصُور) شتێكە كە گوشرابێ، (مَعْصُورُ وعُصَارة) تڵت‌و پاشماوەی شتی گوشراو، گەردەلوول كە دێ هەر شتێك بكەوێتە بەری دەیگوشێ‌و ڕەپێچەكی دەداو كۆی دەكاتەوە.

## مانای گشتی ئایەتەکان

خوا ﷻ هانی بڕواداران دەدا بۆ بەخشینی ماڵو سامانیانو خەرجکردنی لە پێناوی خواداو بە ڕەچاوکردنی ئەدەبو ڕەوشتە بەرزەکانەوەو دەفەرموێ: ﴿ مَّثَلُ ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمْوَٰلَهُمْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ كَمَثَلِ حَبَّةٍ أَنۢبَتَتْ سَبْعَ سَنَابِلَ فِي كُلِّ سُنۢبُلَةٍ مِّاْئَةُ حَبَّةٍ ﴾، وێنەی ئەوانەی ماڵو سامانەکانیان لە پێناوی خوادا دەبەخشن، وەك دەنکە تۆوێك وایە کە حەوت گوڵان دەردەکات، هەر گوڵەی سەد دەنکی تێدایە، واتە: یەك بە حەوت سەد ﴿ وَٱللَّهُ يُضَٰعِفُ لِمَن يَشَآءُ ﴾، وە خوا چەند بەرانبەر دەکات بۆ هەرکەسێك کە بیەوێ، واتە: لە یەك بە حەوت سەد بەرانبەر زیاتریش پاداشت دەداتەوە ﴿ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ ﴾، وە خوا فراوانەو زانایە، ڕەحمەتی فراوانی هەیەو زانیاری فراوانی هەیە، وە هەموو سیفەتەکانی خوا فراوانن، دیارە ئەوە بۆ هاندانی مسوڵمانانە، کە لە بەخشینی ماڵو سامانەکانیان نەترسێن، چونکە هەرچی دەیبەخشن خوای بەخشندە زۆر زۆر زیاتر لە دواڕۆژدا پاداشتیان دەداتەوە، بەڵکو زۆرجار هەر لە دنیاشدا بەخشین دەبێتە هۆی ئەوە کە مرۆڤ ماڵەکەی بەرەکەتی بکەوێتیو خەڵك موعامەلەی لەگەڵیدا خۆشتربێ، وە ئەو کەسانەی کە خێرومەندنو چاکە لەگەڵ خەڵك دەکەن، خەڵك خۆشی دەوێنو ماڵو سامانی دەپارێزنو، ئەگەر لێیان بقەومێ پشتگیرییان لێدەکەنو تەماع لە ماڵو سامانەکەیان ناکەن، وە بە پێچەوانەوەشەوە بابای چرووكو ڕەزیل پێش دواڕۆژ هەر لە دنیادا دووچاری زەرەرو زیان دەبێ.

ئنجا دەفەرموێ: ﴿ ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمْوَٰلَهُمْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ثُمَّ لَا يُتْبِعُونَ مَآ أَنفَقُواْ مَنًّا وَلَآ أَذًى ﴾، ئەوانەی ماڵو سامانەکانیان لە پێناوی خوادا دەبەخشنو دوای بەخشینەکە هیچ منەتکردنو ئازاردان ناکەنە پاشکۆی بەخشینەکەیان، واتە: ئەو کەسەی کە چاکەی لەگەڵدا دەکات منەتی لەسەر ناکاتو ئازاریشی نادات،

منەتکردن ڕووبەڕوویە، بەڵام ئازاردان باسکردنی پاشملەیە، هەیە چاکەیەك دەکات هێندەی دەڵێتەوەو هێندەی دووبارە دەکاتەوە، ئەوەی چاکەکەی لەگەڵ کراوەو بەخششەکەی وەرگرتوە، دەڵێ: سەد خۆزگە هەر وەرم نەگرتبایە ! مانای وایە بابای چاکەکار لەسەری قەرزدار بۆوە، جا دەفەرموێ: ئەوانەی ئاوا چاکە دەکەن، دوایی نە منەت دەکەنو نە ئازاری بابای خێرپێکراویش دەدەن، یانی: نە بەرەوڕوو، نە پاشملە باسی ناکەن، بۆچی؟ چونکە بابای بڕوادار ئەوماڵە نابێ بە هی خۆی بزانێ، دەڵێ: بەڵکو ئەوە ئەمانەتی خوایەو سپاردەیەکە لە دەستی مندایە، دەیگەیەنم بە شوێنی خۆی، پیاو چاکەکانی پێشین وابوون، کە کەسێك هاتبێ زەکاتی بدەنێ، بابای زەکاتدەر گوتوویەتی: زۆرزۆر مەمنوونمو سوپاست دەکەم، زەکات وەرگر گوتوویەتی: بۆچی ؟ گوتوویەتی: تۆ هاتیو ئەوە هەقی خۆتە خوای دادگەر ئەو هەقەی لەسەر من پێویست کردوە، چاکبوو جەنابت ئەو هەقەت وەرگرت، دەنا گوناهبار دەبووم ! جا دەفەرموێ: ئەوانەی وابن: ﴿لَّهُمۡ أَجۡرُهُمۡ عِندَ رَبِّهِمۡ﴾، پاداشتیان هەیە لای پەروەردگاریان ﴿وَلَا خَوۡفٌ عَلَيۡهِمۡ وَلَا هُمۡ يَحۡزَنُونَ﴾، وە نە ترسیان هەیە بۆ داهاتووو نە خەمباریش دەبن بۆ ڕابردوو، بۆ ڕابردوو خەمبار نابن، چونکە ڕابردوویان پاکەو، بۆ داهاتووش ناترسێن، چونکە ئەوەی ڕابردووی پاك بێ بێباکەو بەرچاوی ڕووناکە.

ئنجا خوای شارەزا فێری ئەدەبێکی بەرزی ماڵو سامان بەخشینمان دەکاتو دەفەرموێ: ﴿قَوۡلٞ مَّعۡرُوفٞ وَمَغۡفِرَةٌ﴾ واتە: قسەیەکی باشو پەسند، وە لێبوردنێك لەگەڵ بابای ئاتاجدا، {کە دێ داوات لێدەکات، ئەگەر قسەیەکی باشی لەگەڵدا بکەی، وە لێیببووری ئەگەر ئەزیەتی دایو زۆر ئیلحاحی کردو تەکلیفی کرد، ئەگەر هیچیشی نەدەیە، بەس قسەیەکی باشی لەگەڵدا بکەیو بڵێی: بڕوا بکە بەدەستمەوە نیە، عوزرێکی بۆ بێنیەوە} ﴿خَيۡرٞ مِّن صَدَقَةٖ يَتۡبَعُهَآ أَذٗى﴾، {هیچی نەدەیە، بەڵام قسەیەکی خۆشی لەگەڵدا بکەیو ڕێزی بگری} زۆر باشترە لە چاکە لەگەڵدا کردنێك کە ئازاری بەدوادا بێت، بۆ نموونە: خێری

پێبکەی‌و پێی بڵێی: دەبڕۆ دەی بیگرە، هەر چاوتان تێرنەبوو ! خێرەکەت هەر مەکە باشترە، نەك خێر بکەی‌و دوایی بەچاویدا بدەیەوەو، دڵی ئەزیەت بدەی‌و منەتی لەسەر بکەی، ﴿ وَٱللَّهُ غَنِيٌّ حَلِيمٌ ﴾، وە خوا بێنیازەو هێدیی‌و مەندە، خوا دەوڵەمەندە هەرچەندە ببەخشن خوای پەروەردگار لە دوارۆژدا پاداشتتان دەداتەوەو، لە دنیاشدا بۆتان زیاد دەکات، وە خوا هێدیی‌و مەندیشە، کەواتە: وەك چۆن خوا هێدیی‌و مەندە، ئێوەش چاو لە خوای بەخشەری پەروەردگاری خۆتان بکەن‌و، ئەو سیفەتە پەسندە لە خۆتاندا بهێننەدی، هێدیی بن‌و تووڕە مەبن.

ئنجا ڕوو لە ئیمانداران دەکات‌و دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تُبۡطِلُواْ صَدَقَٰتِكُم بِٱلۡمَنِّ وَٱلۡأَذَىٰ ﴾، ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! خێرو چاکەکانتان بەخشینەکانتان بە منەتکردن‌و بە ئازاردان هەڵمەوەشێننەوە، ئەم ئایەتە زۆر بەڕاشکاویی پێمان دەڵێ: کەسێك کە خێرو چاکەیەك دەکات، بەڵام دوایی منەت بەسەر خێر پێکراوەکەدا دەکات، یاخود ئازاری دەدا، باسی دەکات لەم لاولاو پێی دەگاتەوەو دڵی پێی ناڕەحەت دەبێ، خێرەکەی دەچێتەوە هیچێ‌و هەڵدەوەشێتەوە، دوایی خوای پەنهانزان دەفەرموێ: ﴿ كَٱلَّذِي يُنفِقُ مَالَهُۥ رِئَآءَ ٱلنَّاسِ وَلَا يُؤۡمِنُ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ ﴾، واتە: با هەڵسوکەوتەکانتان لە بەخشیندا، وەك هی کەسێك نەبێ کە ماڵ دەبەخشێ بەس بۆ ڕووپامایی خەڵك، {بۆ ئەوەی خەڵك مەدحی بکات بڵێن: ماشاء الله چەند سەخیی‌و نان بدەیەو، چەند خێرەومەندە !} وە بڕوای بەخواو بە ڕۆژی دوایی نیە، {واتە: ئەو سیفەتە، سیفەتی کەسانی ڕیابازو بێبڕوایە کە تۆ خێر بکەی دوای منەت بکەی، ببەخشی‌و دوایی بەچاوی کابرادا بدەیەوە! ئەوە سیفەتی کەسانی بێبڕواو ڕیابازەو وەك ئەوان مەکەن}.

ئنجا خوا ﷻ وێنەیەکیشمان بۆ دێنێتەوە، بۆ ئەوەی بیخاتە بەرچاومان، چونکە وێنە هێنانەوە شێوازێکی گرنگە بۆ تێگەیاندنی خەڵك، چونکە ئەو قسەیە کە دەیکەی، چەمك‌و واتایەکەی ڕووت (مجرد)ە، بەڵام کە لە قاڵبی وێنەدا داتڕشت، بە خەیاڵ‌و ئەندێشە دەتوانی تەماشای بکەی، دەفەرموێ:

﴿ فَمَثَلُهُۥ كَمَثَلِ صَفْوَانٍ عَلَيْهِ تُرَابٌ فَأَصَابَهُۥ وَابِلٌ فَتَرَكَهُۥ صَلْدًا ﴾، وێنەی {کەسێك کە بڕوای بە خواو بە ڕۆژی دوایی نیەو بە ڕیابازیی ماڵی خۆی سەرف دەکات، نەك بۆ خوا} وەك تاتە بەردێکی لووسی سپی وایە، تەنکە گڵێکی لەسەرە بارانێکی دڵۆپە زل لێیدەدا ﴿ فَتَرَكَهُۥ صَلْدًا ﴾، هیچی پێوە ناهێڵێ‌و دەیشواتەوە، {واتە: ئەو چاکەو خێرانەی کە ئێوەش دەیانکەن منەتکردنەکەتان‌و ئازاردانەکەتان، وەك بارانەکە وایەو چاکەکەتان دەشواتەوە هیچی نامێنێتەوە} ﴿ لَّا يَقْدِرُونَ عَلَىٰ شَيْءٍ مِّمَّا كَسَبُوا۟ ﴾، {کەسێك کە تەنکە گڵێکی هەبێت لەسەر تاتە بەردێکی لووس، بارانێك لێیبدات، هیچی بۆ دەمێنێتەوە ؟ نەخێر، ئەوجۆرە کەسانەش لە دواڕۆژدا کە بە حیساب خێریان کردوەو زەکاتیان داوەو چاکەیان کردوە، دوایی تەماشا دەکەن هیچیان بۆ نەماوەتەوە لە قیامەتێ} لە دواڕۆژدا توانایان بەسەر هیچیدانیەو هیچیان دەستگیر نابێتەوە هیچیان بۆ نەماوەتەوە ﴿ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلْكَـٰفِرِينَ ﴾، وە خوا ڕێنمایی کەسانی بێبڕوا ناکات، کەواتە: ئەوەش سیفەتی بێبڕوایانە نەك سیفەتی ئیمانداران.

ئنجا دێتە سەر باسی سیفەتی ئەوانەی کە لە پێناوی خواداو بۆ ڕەزامەندیی خوا، وە بۆ ئەوەی کە مسوڵمانەتی خۆیان زیاتر بچەسپێنن‌و ئیمان زیاتر لە دڵی خۆیان دابکوتن ماڵ‌و سامانی خۆیان دەبەخشن، باسی وانیش دەکات‌و وێنە بۆ وانیش دەهێنێتەوە: ﴿ وَمَثَلُ ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمْوَٰلَهُمُ ٱبْتِغَآءَ مَرْضَاتِ ٱللَّهِ ﴾، وە وێنەی ئەوانەی کە ماڵ‌و سامانەکانیان دەبەخشن بۆ وەدەستهێنانی ڕەزامەندیی خوا ﴿ وَتَثْبِيتًا مِّنْ أَنفُسِهِمْ ﴾، وە بۆ ئەوەش کە نەفسی خۆیان زیاتر بچەسپێنن لەسەر مسوڵمانەتیی، یاخود بۆ ئەوە کە ئیمان زیاتر لە دڵی خۆیاندا بچەسپێنن، یاخود بۆ ئەوە کە سیفەتی بەخشندەیی‌و کەرەم‌و سەخاوەت زیاتر لە دڵی خۆیاندا ڕیشەدار بکەن، وێنەی ئەوان وەك چی وایە ؟ ﴿ كَمَثَلِ جَنَّةٍۭ بِرَبْوَةٍ ﴾، وەك باخێك وایە بە تەپۆڵکەیەکەوە، بە شوێنێکی بەرزەوە، ﴿ أَصَابَهَا وَابِلٌ فَـَٔاتَتْ

﴿ أُكُلَهَا ضِعْفَيْنِ ﴾، بارانێکی دڵۆپە زل لێی بداتو بەرەکەی دوو بەرانبەر بێتەوە، میوەکەی دوو قات بێتەوە ﴿ فَإِن لَّمْ يُصِبْهَا وَابِلٌ فَطَلٌّ ﴾، وە ئەگەر بارانێکی دڵۆپە زلیش لێی نەدا، نمە بارانێکی بەسە، چونکە شوێنەکەی زۆر بەپیتو بەرەکەتە، زەوییەکەی زۆر چاکە، نمە بارانێکی بەسە.

لێرەدا خوای زاناو شارەزا دوو حاڵەتی باسکردوون:

یان بارانێکی دڵۆپە زل لێیدەداتو کە بەرەکەی دوو قات دەکاتەوە، یان نمە بارانێك، چونکە ئینسانی مسوڵمان یان زۆر دەبەخشێ، چونکە لە توانایدا هەیە، ئەو کاتە پاداشتی زیاترە، یاخود توانای کەمترەو کەم دەبەخشێ، ئەوەش هەر دیسان پاداشتی هەیە، واتە: ئیماندار قەت نابێ چرووك بێ، ئەگەر زۆری هەبوو زۆر دەبەخشێو، کەمی هەبوو کەم دەبەخشێ، بەڵام قەت چنگ قووچاو نابێ ﴿ وَٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ بَصِيرٌ ﴾، وە خوا بینەری ئەوەیە کە دەیکەن.

ئنجا خوا ﷻ وێنەیەکی دیکەمان بۆ دێنێتەوە بۆ ئەوانەی کە منەت دەکەنو ئازاری ئەوانە دەدەن کە پێیان دەبەخشن، بۆ ئەوەی زیاتر لەبەرچاومان بیچەسپێنێ کە ڕیابازییو منەتکردن لەسەر ئەوانەی پێیان دەبەخشین، وەك ئاگرێك وایە کە بەری دەدەینە خەرمانی خۆمان، دەفەرموێ: ﴿ أَيَوَدُّ أَحَدُكُمْ أَن تَكُونَ لَهُۥ جَنَّةٌ مِّن نَّخِيلٍ وَأَعۡنَابٍ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ ﴾، ئایا یەکێکتان حەز دەکات باخێکی هەبێ لە دارخورماو لە ترێ، ڕووبارگەل بە بنیدا بڕۆن، واتە: شوێنەکەی وابێ کە هەمیشە جۆگەو جۆباری بە بندا بڕواو، پەکی لەسەر ئاوێ نەکەوێ ﴿ لَهُۥ فِيهَا مِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِ ﴾، هەموو جۆرە میوەیەکی تێیدا هەبێت، ئایا بۆچی لەو باغەدا تەنا باسی درەختی خورماو درەختی ترێی کردوە؟ چونکە: دارخورما بەرزترین دارەو دار ترێش نزمترین دارە، واتە: هەر لە بەرزترین درەختەوە، هەتاکو نزمترین درەخت تێیدایە، چونکە دوایی کە دەفەرموێ: ﴿ لَهُۥ

﴿ فِيهَا مِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِ ﴾، هەمووو جۆرە میوەیەكی تێدا هەیە، خۆ ئەگەر هەر تەنیا خورماو ترێ بووایە، دەیفەرموو: هەر خورماو ترێی تێدایە، بەڵام خوای پەروەردگار بەرزترین درەختی هێناوە، كە دارخورمایە، دوایی نزمترین درەختیش كە دار مێوەو، هەر بە زەوییەوە پان دەبێتەوە، واتە: هەموو جۆرە درەختێكی تێدایە هەر لە بەرزترینی تا نزمترینی، وە هەموو میوەیەكی تێدایە ﴿ وَأَصَابَهُ ٱلْكِبَرُ وَلَهُۥ ذُرِّيَّةٌ ضُعَفَآءُ ﴾، ئایا یەكێ لە ئێوە حەز دەكات باغێكی ئاوای هەبێ: دوایی بكەوێتە تەمەنەوە، وە ماڵو منداڵێكی وردو سەلكەو پێچكەشی هەبن، كە بەخێوكردنیان بەزەحمەتەو بۆخۆیان كەسابەتیان پێناكرێ، لەو حاڵەتەدا: ﴿ فَأَصَابَهَآ إِعْصَارٌ فِيهِ نَارٌ فَٱحْتَرَقَتْ ﴾، گێژەڵووكەو گەردەلوولێك كە ئاگری تێدایە، لێیبداو بیسووتێنێو باغەكە هیچی نەمێنێ، یەكێك لە ئێوە حەز دەكات ئاوای بەسەر بێت ؟ نەخێر، كەواتە: ئێوەش خەرمانی چاكەكانی خۆتان بەمنەتو ئازاردانو بە باسكردن هەڵمەوەشێننەوەو، چاكەكانتان بەربادمەكەن ﴿ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمُ ٱلْءَايَٰتِ لَعَلَّكُمْ تَتَفَكَّرُونَ ﴾، ئاوا خوای ئایەتەكانی بۆ ئێوە ڕوون دەكاتەوە بەڵكو بیر بكەنەوە.

تەماشا بكەن ئەو مەسەلەیە خوا ﷻ چەندی گرنگی پێداوە ئەو هەموو ئایەتانەی لەبارەوە ناردوون، پێنج ئایەت هەموویان باسی چۆنیەتی بەخشینن، كە دەبێ ئاوا ببەخشرێ، تەنیا بۆ ڕەزامەندیی خوا بێت، وە دەبێ بەخشەر قسەی خۆش لەگەڵ بابای خێر پێكراودا بكات، ئەگەر هەر نەشیداتێ قەیناكات، بەڵام با هەر قسەی خۆشی لەگەڵدا بكات، جا تەماشای ئەو ئەدەبو ڕەوشتتە بەرزانە بكەن، كە ئیسلام دەوڵەمەندەكانی پێ ئامۆژگاریی دەكاتو خێرومەندەكانی پێ ئامۆژگاریی دەكات، چەند بەرزن، بەڵام تەماشای هەڵسوكەوتی هەندێ لە دەوڵەمەندو خێرومەندەكانیش بكەن، كە خێر دەكات بەڵام نەیكات باشترە ! چاكەیەك دەكات زۆر باسی دەكاتو منەت دەكات، كەچی خوای پەروەردگاریش ئاوا دەفەرموێ، وە لە حەقیقەتیشدا لە ڕوانگەی ئیمانو

ئیسلامەوە، منەتکردنو ئازاردانی دڵی کەسی پێ بەخشراوو خێرپێکراو، شتێکی زۆربێجێیە، بۆچی ؟ چونکە تۆ نابێ ئەو ماڵە بە هی خۆت بزانی، خوای بەخشەر دەفەرموێ: ﴿ ... وَأَنفِقُواْ مِمَّا جَعَلَكُم مُّسْتَخْلَفِينَ فِيهِ ...﴿٧﴾ ﴾ الحديد، واتە: لەو ماڵە ببەخشن کە خوا ئێوەی تێداکردوە، بە جێنشین، کەواتە: ماڵەکە هی خۆت نیەو هی خوایەو ئەمانەتە لە دەستی تۆ دایەو، تۆ بەس دەیگەیەنی بە شوێنی خۆی، جا تۆ هەر لەبەر ئەوەی ئەو ماڵە لەوێوە دەگوازیەوە بۆ ئەوێ، دەبێ منەتێ بکەی ؟ نەخێر، چونکە خوای کاربەجێ ڕزقێکی کردۆتە دەستی تۆ، تۆی پێ تاقیدەکاتەوەو دەیگەیەنی بە شوێنی خۆی، کەچی هەر لەخۆتدا حەصری دەکەی‌و بەشی کەس نادەی، یان ئەگەر هەندێکیشت بەخشی بە کۆمەڵێك بەمنەت دەیبەخشی ! بەڵێ ئەگەر لە هەموو بەرنامەیەکداو لە هەموو دینێکدا بگونجێ بابای خێرکەرو ماڵ بەخشەر، منەت بکاو باسی بکا، لە ئیسلامدا ناگونجێ، بۆیە مسوڵمانان زۆر پێویستییان بەوە هەیە کە بەڕاستی لە بواری بەخشین‌و خێرو چاکەدا، زۆر چاو بەخۆیاندا بگێڕنەوەو، تەماشای ئەخلاق‌و هەڵسوکەوتی خۆیان بکەنەوە، کە زۆری پێچەوانەی ئەوەیە کە خوای بەخشندە مسوڵمانانی پێ ئامۆژگاریی کردوە، خوای پەروەردگار بە لوتف‌و کەرەمی خۆی لەو کەسانەمان بگێڕێ کە ئەهلی سەخاوەت‌و بەخشندەیین، لە کەمی کەم‌و لە زۆری زۆر، وە خوا لەو کەسانەمان بگێڕێ کە بڕازێینەوە بەو سیفەت‌و ڕەوشت‌و ئەدەبە بەرزانەی کە خوای کاربەجێ بە مەرجی گرتوون، بۆ کەسانێك کە خێرو چاکە دەکەن.

## چەند مەسەلەیەکی گرنگ

**مەسەلەی یەکەم:** خوای پەروەردگار ئەو کەسانەی کە ماڵ‌و سامانی خۆیان لە پێناوی خوادا دەبەخشن، کارەکەیان بە دەنکە تۆوێك دەشوبهێنێ، کە دوای ئەوەی دەڕوێت حەوت گوڵ دەردەکات، هەر گوڵە سەد دەنکی تێدایە، کە دیارە دەکاتە یەك بە حەوت سەد، لێرەدا خوا ﷻ وێنەی پاداشتدانەوەی خۆی بۆ بەخشەران‌و خێرومەندان بە چەندان بەرانبەر لە وێنەیەکدا بۆ ئێمە وێنا

دەکات، کە بریتیـە لەوەی کەسێك دەنکە دانەوێڵـەیەك بچێنـێ‌و دوایـی حـەوت سـەد بەرانبـەر بەرهـەمی بێتــە دەسـت، دیـارە پێـشتریش باسمـان کـرد کـە حیکمەتی وێنە هێنـانەوە ئەوەیە، کە ئێمە باشتـر تێبگەین لە سۆنگەی ئەوەوە، کە چەمك‌و واتای مەعنەویی لە شێوەی وێنەی بەرجەستەکراودا دەخرێنە ڕوو.

**مەسەلەی دووەم:** کە دەفـەرموێ: ﴿كَمَثَلِ حَبَّـةٍ أَنْبَتَتْ سَبْعَ سَنَابِلَ فِي كُلِّ سُنْبُلَةٍ مِّائَةُ حَبَّةٍ﴾، وێنـەی ئەوانەی کە ماڵی خۆیان لە پێناوی خوادا دەبەخـشن، وەك دەنکە تۆوێـك وایـە حـەوت گوڵان دەردەکات، هـەر گوڵـەی سـەد دەنکـی تێدایـە، توێـژەرەوانی قوڕئـان زۆریـان قسـە لـەبارەوە کـردوەو گوتوویانـە: دەبـێ ئـەوە چ جۆرە دانەوێڵـەیەك بـێ ؟ ئایـا مەبەسـت لـە ﴿سَنَابِلَ﴾، گوڵـە گەنــمن ؟ یـان گوڵـە جـۆن ؟ یـان گوڵــە مـەرەزەن ؟ یـان گوڵـە هـەرزنن ؟! ...هتـد، بـەڵام لـە ڕاسـتیدا وەك چۆن خوای بـێ وێنـە هـەر ئەوەنـدە فەرموویـەتی: دەنکـە تۆوێـك دەچێنــدرێ‌و دوایـی ئـەو دەنکـە تـۆوە دەڕوێ‌و حـەوت گـوڵان دەردەکـات، هـەر گوڵەی سەد دەنکی تێدایە، دیارە عیبـرەت‌و پەندێك، کە ئێمە دەبێ وەریبگرین، ئەوەیـە کـە مـاڵ بەخـشین، پاداشـتی زۆری هەیـەو خـوا لـە دوارۆژدا پاداشــتی زۆرمان دەداتەوەو، بەڵکو هەر لە دنیاشدا ئینسانی بەخشندە ئیستیفادە دەکات، پەندو عیبـرەتەکەش بەوەندە دێتـە دی، بۆیـە خـوا ﷻ دیـاری نـەکردوەو، ئـەو مشـت‌ومڕەش توێژەرەوانی قوڕئانی نەیگـەیاندۆتە هیچ ئەنجامێـك !

بۆیە من پێم وایـە ئـەو مـشـت‌ومـڕە هـەمووی زیـادە، هەروەهـا زۆریـش باسـی ئەوەیان کردوە، کە ئایـا دەگونجـێ دەنکـە تۆوێـك حـەوت گوڵان دەربکات ؟ لـە کـوێ ؟ وە دەبـێ لـە چ جـۆرە زەوییـەکـدا یـەك بـە حەوسـەد بێنێـت ؟ بـەڵام ئەوەش دیسان پێویست ناکـات، چونکە خـوای کاربـەجێ ئـەو وێنەیـە بـۆ ئێمـە دێنێتـەوەو دەفـەرموێ: هـەر چاکەیەك یـەك بـە حـەوت سـەد بەرانبـەر بـەلای کەمەوە پاداشـت دەدرێتـەوە، دیارە هیچ پەکیش لەسەر ئەوە نەکەوتوە، کـە ئایـا ئەو دانەوێڵـەیە، لـە کوێیـەو کـێ دەیچێنـێ‌و ...هتـد ؟!

**مەسەلەی سێیەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ وَٱللَّهُ يُضَٰعِفُ لِمَن يَشَآءُ ﴾، وە خوا چەند بەرانبەر دەکاتەوە بۆ هەرکەسێك کە بیەوێ، ئایا مەبەست ئەوەیە لە یەك بە حەوت سەد زیاتریش بەرانبەر دەکاتەوەو پاداشت دەداتەوە، یان مەبەست پێی ئەوەیە کە خوای زاڵی خاوەن شکۆ، یەك بە حەوت سەد پاداشت دەداتەوە، یان یەك بە حەوت سەد زیاتریش مەبەست پێی کامیانە؟ وا پێدەچێ مەبەست پێی یەك بە حەوت سەد زیاتریش بێ، چونکە دوای ئەوەی دەفەرموێ: ﴿ مَّثَلُ ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمْوَٰلَهُمْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ كَمَثَلِ حَبَّةٍ أَنۢبَتَتْ سَبْعَ سَنَابِلَ فِي كُلِّ سُنۢبُلَةٍ مِّائَةُ حَبَّةٍ ﴾، ئنجا دەفەرموێ: ﴿ وَٱللَّهُ يُضَٰعِفُ لِمَن يَشَآءُ ﴾، کەواتە: خوا بۆ هەرکەسێك کە بیەوێ، لە یەك بە حەوت سەد، یان زیاتریش پاداشتی دەداتەوە، لەوبارەشەوە فەرمایشتی پێغەمبەر ﷺ زۆرن:

**فەرموودەی یەکەم:** {(عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ رضي الله عنه، أَنَّ رَجُلاً تَصَدَّقَ بِنَاقَةٍ مَخْطُومَةٍ فِي سَبِيلِ اللهِ، فَقَالَ: رَسُولُ اللهِ ﷺ لَكَ بِهَا يَوْمَ الْقِيَامَةِ، سَبْعُ مِائَةِ نَاقَةٍ مَخْطُومَةٍ) (رَوَاهُ مسلم برقم: (٤٨٧٤)، وَالنَّسَائِيُّ برقم: (٣١٨٧)، وَالْحَاكِمُ برقم: (٢٤٤٩)}، واتە: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ: پیاوێك لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ وشترێکی بە جڵەوەوە (بە ڕێشمەو ئەوسارەوە) لەپێناوی خوادا بەخشی، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: لە ڕۆژی دواییدا حەوت سەد وشترت بە جڵەوو ئەوسارەوە لە بەرانبەردا دەدرێتەوە.

لێرەدا ئێمە دەبێ لە فەرمایشتەکانی پێغەمبەر ﷺ وەك خۆی مەبەستی بووە حاڵی بین لێرەدا مەبەست ئەوە نیە، کە لەوێ هەرکەسێك وشترێکی کردبێتە خێر، خوای پەروەردگار بفەرموێ: ها ئەوە حەوت سەد وشتر ! بەڵکو واتە: پاداشتی بە ئەندازەی حەوت سەد بەرانبەر دەدرێتەوە، ئەگەرنا کابرا لەوێ ڕەنگە بڵێ: جا ئەو هەموو وشترانە چ لێبکەم لە کوێیان دابنێم !! وە کەسێك بە سادەیی و سەرکێڵیی تەماشای فەرمایشتەکە بکات، ڕەنگە بڵێ: جا باشە کابرا حەوت سەد وشتر لە کوێ دابنێ ؟ چۆن دەبێ بەهەشت

وشتری لێبن !! نا مەبەست ئەوەیە بە ئەندازەی قیمەتو بەهای حەوت سەد وشتر، خوا پاداشتی دەداتەوە.

**فەرموودەی دووەم:** پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {(مَنْ أَنْفَقَ نَفَقَةً فِي سَبِيلِ اللهِ كُتِبَتْ لَهُ بِسَبْعِ مِئَةِ ضِعْفٍ) (رَوَاهُ التِّرمِذِيُّ برقم: (١٦٢٥) وحَسَّنَهُ، وَالنَّسَائِيُّ برقم: (٣١٨٦)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٤٦٤٧)، وَالحَاكِمُ برقم: (٢٤٤١)، عن خُرَيمِ إبن فاتكٍ، وَصَحَّحَهُ الألباني في (صحيح الجامع) برقم: (١٨٩٧)}، واتە: هەر کەسێك لە پێناوی خوادا نەفەقەیەك بکات {واتە: ماڵێك خەرج بکات، بەخشینێك بکات} بە حەوت سەد بەرانبەر بۆی دەنووسرێ.

دیارە ﴿ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ﴾، واتە: بۆ وەدەستهێنانی ڕەزامەندیی خوا، لە پێناوی خوادا، مەبەستی ئەوەبێ کە خوا لێی ڕازی بێ، دیارە کە مەبەستیشت بوو خوا لێت ڕازی بێ، ماڵەکەشت بەو شێوەیە صەرف دەکەی کە خوا دیاری کردووە، دەیدەی بە کەسی شیاوی خۆی‌و، لە شوێنی شیاوی خۆیدا صەرفی دەکەی، چونکە هەرکەسێك شتێك لە پێناوی خوادا بکات، دەبێ بە پێی شەرعی خواش بیکات، ئەو دووانە هەردووکیان پێکەوەن، لە پێناوی خواداو ڕەزامەندیی خوا، وات لێدەکات کە بە پێی شەرعی خواش بجووڵێیەوە.

**فەرموودەی سێیەم:** پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {(كُلُّ عَمَلِ ابْنِ آدَمَ يُضَاعَفُ، الحَسَنَةُ بِعَشْرِ أَمْثَالِهَا إِلَى سَبْعِ مِائَةِ ضِعْفٍ إِلَى مَاشَاءَ اللهُ) (رَوَاهُ مسلم برقم: (٢٧٠٠)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (١٦٣٨)، عَنْ أَبِي هُرَيرَةَ رضي الله عنه}، واتە: هەموو کردەوەی ئادەمیزاد چاکە بە دە بەرانبەر پاداشت دەدرێتەوە {بە لای کەمەوە} هەتاکو حەوت‌سەد بەرانبەر، هەتاکو ئەو ئەندازەیەی کە خوا بۆخۆی دەیزانێ.

هەڵبەتە ئەم فەرمایشتە پشتگیریی ئەو ڕایە دەکات کە گوتمان فەرمایشتی خوا: ﴿ وَٱللَّهُ يُضَٰعِفُ لِمَن يَشَآءُ ﴾، ئەوەی لێ دەفامرێتەوە کە پاداشتی بەخشین لە حەوت سەد بەرانبەریش زیاترە، جا ئایا لە ئەنجامی چیدا خوا ﷻ پاداشتەکەی چەند قاتو چەند بەرانبەر دەکاتەوە ؟ دیارە لە ئەنجامی

ئیخلاصی باشترو نیەتی چاکترو، شوێن پێگرتنی چاکتردا، کە مرۆڤ هیچ مەبەستی ئەوە نەبێ باسبکرێو، هیچ مەبەستی دنیا نەبێو، ئیخلاصەکەی زۆر باشبێ، وە باشیش شوێنی پێبگرێو، بەرژەوەندییەکی باشی پێ تەحقیق بکات، هەتا لەو دوو ڕووەوە بەخشینەکە باشتربێ، پاداشتی زیاترە، چونکە جاری وایە کابرا ئیخلاصی باشی هەیە، بەڵام شوێنی باشی پێناگرێ، وە جاری واش هەیە شوێنی پێدەگرێو لە شوێنی شایستەدا دایدەنێ، بەڵام نیەتەکەی زۆر تەواونیەو کەمو زۆر شتی دنیایی ڕەگەڵ دەکەوێ، بۆ وێنە: پێی خۆشە خەڵکیش پێی بزانێ کە بەخشندەیە، کەواتە: بە ئەندازەی ئەوە کە ئیخلاص زیادبێ شوێن پێگرتن چاك دەبێ، پاداشتەکەش چەند بەرانبەر دەبێتەوە لە حەوت سەدیش زیاتر.

**مەسەلەی چوارەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمْوَٰلَهُمْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ثُمَّ لَا يُتْبِعُونَ مَآ أَنفَقُوا۟ مَنًّا وَلَآ أَذًى ۙ لَّهُمْ أَجْرُهُمْ عِندَ رَبِّهِمْ وَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴾، ئەوەی لێوەردەگیرێ کە کاتێك کەسێك خێرێك دەکات، چاکەیەك دەکات، دەست گرۆیی نەدارێك، هەژارێك، لێ قەوماوێك، هەتیوێك، بێوە ژنێك دەکات، ئەگەر منەتی لەسەر بکات ڕووبەڕوو یان پاشە ملە باسی بکاتو دڵی ئازار بدات، ئەوە نەك هەر پاداشت وەرناگرێتەوە، بەڵکو لەسەریشی سزا دەدرێ، واتە: وەك چۆن کەسێك دانەوێڵەیەك دەچێنێت، بەڵام دوایی بۆ وێنە: سەد تەنەکەی بەو زەوییە وەرکردوە، دوایی پەنجا تەنەکەی دێتەوە دەستی، دەڵێن چی؟ دەڵێن: بنە تۆوی خۆی نەکردەوە، واتە: ئەو ئەندازە دەغڵەی کە بە زەوی وەرکرد بوو، ئەوەندەشی دەست نەکەوتەوە، جگە لە کرێی جووت مەسرەفو ماندوبوون، هەموو ئەوەش لەسەر زەرەروزیان ڕادەوەستێ، خوا ﷻ کە دەفەرموێ: ﴿ ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمْوَٰلَهُمْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ثُمَّ لَا يُتْبِعُونَ مَآ أَنفَقُوا۟ مَنًّا وَلَآ أَذًى ۙ لَّهُمْ أَجْرُهُمْ عِندَ رَبِّهِمْ ﴾، ئەوانەی خێرو چاکە دەکەنو دوایی منەت ناکەنو ئازاری دڵی بابای خێر پێکراو نادەن، ئا ئەوانە پاداشتی خۆیانیان هەیە

لای پەروەردگاریان، دیارە ئەوەش کە وانەبێ، نەك هەر پاداشتی نیە، بەڵکو دەبێ چاوەڕێی سزاو تۆڵەش بکات ! عەرەب جوانیان گوتوە، لێرەدا دەڵێن: (صِنوَان: مَنْ مَنَحَ سَائِلَهُ ومَنَّ، وَمَنْ مَنَعَ نَائِلَهُ وضَنَّ) واتە: وەك یەكن، ئەوەی کە کەسێك داوای لێ دەکاتو پێی دەبەخشێو، دوایی منەتی لەسەر دەکات، لەگەڵ ئەوەی دیکە کە کەسێك داوای شتێکی لێ دەکاتو نایداتێو چرووکیی دەکات، بەڵکو من دەڵێم: لەڕاستیدا ئەوەی کە دەبەخشێو منەت دەکات، یان بابای خێر پێکراو ئازار دەدات، خراپتریشە لەوەی کە نابەخشێ، بۆچی؟ چونکە ئەوە نیعمەتێکە خوا پێی داوە، کەچی منەتی پێ بەسەر خەڵکیدا دەکاتو پێی لەخۆی بایی دەبێ، وە سەرەنجام دەبێ چاوەڕێی سزاو تۆڵەش بکاتو پاداشتیش ئەوە هەر هیچ !

**مەسەلەی پێنجەم:** خوا ﷻ کە دەفەرموێ: ﴿ قَوْلٌ مَّعْرُوفٌ وَمَغْفِرَةٌ خَيْرٌ مِّن صَدَقَةٍ يَتْبَعُهَآ أَذًى ﴾، واتە: قسەیەکی پەسند، وە لێبوردنێك باشترە لە خێرکردنێك کە ئازاردانی بەدوا دابێ، ئەم ڕستە قورئانییە ئەوەی لێوەردەگیرێ کە خوا زاناو شارەزا لە مامەڵەکردن لەگەڵ ئینسانەکاندا، لایەنی مەعنەویی‌و لایەنی کەرامەتو ڕێزو حورمەتی ئینسانەکانی لە پێش لایەنی مادییەوە داناوە، چونکە ئینسان بەس گەدەو جەستە نیە، بەڵکو ئینسان بەر لەوەی گەدەو جەستە بێ، ڕووحو مەعنەوییاتە، بۆیە خوا ﷻ لایەنە مەعنەوییەکەی پێشخستوەو دەفەرموێ: هەژارو نەدارێك کە دێتە لات ئەگەر هیچیشی نەدەیە، بەس قسەیەکی باشی لەگەڵدا بکەی‌و ئازاری نەدەی، باشترە لەوەی شتێکی بدەیەو منەتی لەسەر بکەی، یاخود بە هەر شێوەیەك بێ ئازاری بدەی، هەر مەیدەیە باشترە لەوەی بیدەیەو هەستی بریندار بکەی، چونکە کە یارمەتی دەدەی‌و هەستی بریندار دەکەی لەڕووی جەستەییەوە خزمەتت پێکردوە، بەڵام لەڕووی مەعنەوییەوە برینداری کردوەو کەرامەتت ڕووشاندوە ! هەر لێیگەڕێی باشترە، با لایەنی ڕووحیی سەلامەت بێ، لە لایەنی جەستەیی گەرێ ! بۆیە پێغەمبەر ﷺ لە یەکێك لە فەرمایشتەکانیدا فەرموویەتی: {(الكَلِمَةُ الطَّيِّبَةُ

صَدَقَةٌ) (رَوَاهُ البُخَارِيُّ برقم: (٢٩٨٩)، وَمسلم برقم: (٢٣٣٢)، عَنْ أبي هُرَيرَةَ رضي الله عنه}، واتە: قسەیەكی باش قسەیەكی چاك خێرو صەدەقەیە، كەواتە: صەدەقە هەر ماڵ بەخشین نیە، هەروەها لە فەرمایشتێكی دیكەدا پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {(إنَّ مِنَ الْمَعْرُوفِ أَنْ تَلْقَى أَخَاكَ بِوَجْهٍ طَلْقٍ) (رَوَاهُ مسلم برقم: (٦٦٣٣)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (١٨٣٣)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٥٢٣)، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ الصَّامِتِ عَنْ أَبِى ذَرٍّ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا}، واتە: لە چاكەكارییە كە تۆ بگەیە برای خۆت بە ڕوویەكی گەش و خۆشەوە بە زەردەخەنەوە.

وە ئنجا لە فەرمایشتێكی دیكەدا پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {(إنَّكُم لا تَسَعُونَ النَّاسَ بأموَالِكُم، وليسعهُم مِنكُم بَسْطُ الوجه، وحُسْنُ الْخُلُقِ) (رَوَاهُ الحَاكِمُ في (المستدرك) برقم: (٤٢٧)، وَحَسَّنَهُ الألباني في (صحيح الجامع) برقم: (٦٧٥٨)}، واتە: ئێوە بە ماڵ سامانتان فریای هەموو خەڵك ناكەون، بەڵام بە ڕووی خۆشتان بە ڕەوشتی جوان فریایان بكەون، واتە: بە ڕووی گەش و ڕەوشتی جوان دەتوانن لەگەڵ هەمووواندا مامەڵە بكەن، ئەخلاقی جوان و ڕووخۆشیی، فراوانەو بەشی هەموو كەس دەكات، بەڵام ماڵ و سامان بەشی هەموو كەس ناكات و سنووردارە، دەتوانی لەگەڵ هەموو كەسدا ڕووت خۆشبێ و قسەت خۆشبێ و ڕێزی هەموو كەس بگری، بەس ناتوانی هەر كەسێك داوای هاوكاریی ماددیی كرد، بۆی جێبەجێ بكەی!

<u>**مەسەلەی شەشەم:**</u> كە دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تُبۡطِلُواْ صَدَقَٰتِكُم بِٱلۡمَنِّ وَٱلۡأَذَىٰ ﴾، ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! خێرو چاكەكانتان بە منەتكردن و ئازاردان هەڵمەوەشێننەوە، لە بەرانبەر ئەم ڕستە قورئانییەدا زانایان بوونەتە دوو بەش، كە ئایا وەك چاكە خراپە دەسڕێتەوە، كە ئەمە دەقی قورئانی لەسەرە، وەك خوا فەرموویەتی: ﴿ ... إِنَّ ٱلۡحَسَنَٰتِ يُذۡهِبۡنَ ٱلسَّيِّـَٔاتِۚ ...﴿١١٤﴾ ﴾ هود، واتە: بێگومان چاكەكان خراپەكان دەسڕنەوەو لایان دەبەن، ئایا بەهەمان شێوە خراپەش چاكە لادەبات؟ لە وەڵامی ئەم پرسیارەدا زانایان بوونە دوو بەش:

بەشێکیان دەڵێن: بەڵێ، وەك چۆن کە خراپەیەك دەکەی ئەگەر چاکەی بەدوادا بکەی دەیسڕێتەوە، بە هەمان شێوە ئەگەر بە دوای چاکەش دا خراپە بکەی هەر دەیسڕێتەوە.

بەشێکیشیان دەڵێن: نەخێر، بەڵکو هەندێك چاکەی تایبەت هەن، بە هەندێ خراپەی تایبەت دەسڕێنەوە، بەڵام بەگشتی خراپەکان چاکەکان ناسڕنەوە، واش پێدەچێ ئەم ڕایە بەهێزتر بێ، چونکە خوا فەرموویەتی: ﴿ ...إِنَّ ٱلْحَسَنَٰتِ يُذْهِبْنَ ٱلسَّيِّـَٔاتِ ... ﴿١١٤﴾ ﴾ هود، چاکەکان بەگشتی خراپەکان بە گشتی لادەبەن، بەڵام بەنسبەت لابرانی چاکە بە خراپە، وای نەفەرموە، بەڵکو لە هەندێ کاتی تایبەت و شوێنی تایبەتدا فەرموویەتی: وریا بن فڵان خراپەیە فڵان چاکەیەتان لێ لانەبات، بۆ وێنە لە سوورەتی (الحجرات)دا دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَرْفَعُوٓا۟ أَصْوَٰتَكُمْ فَوْقَ صَوْتِ ٱلنَّبِىِّ وَلَا تَجْهَرُوا۟ لَهُۥ بِٱلْقَوْلِ كَجَهْرِ بَعْضِكُمْ لِبَعْضٍ أَن تَحْبَطَ أَعْمَٰلُكُمْ وَأَنتُمْ لَا تَشْعُرُونَ ﴿٢﴾ ﴾، واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ دەدوێنن و قسەی لەگەڵدا دەکەن دەنگتان بەسەر دەنگیدا هەڵمەهێنن، {بە دەنگی بەرز قسەی لەگەڵدا مەکەن} نەوەك کردەوەکانتان هەڵبوەشێنەوە، بێئەوەی کە بۆخۆتان هەست پێ بکەن، کەواتە: بێئەدەبیی نواندن بەرانبەر بە پێغەمبەر ﷺ دەبێتە هۆی هەڵوەشانەوەی کردەوەی باش، ئنجا لێرەشدا دەفەرموێ: ﴿ لَا تُبْطِلُوا۟ صَدَقَٰتِكُم بِٱلْمَنِّ وَٱلْأَذَىٰ ﴾، چاکەو خێرەکانتان بە منەتکردن و ئازاردان هەڵمەوەشێننەوە، کەواتە: منەت و ئازاردانیش بۆ بابای خێر پێکراو، ئەو چاکەو خێرەی کە لەگەڵت کردوە، ئەو یارمەتی و هاوکارییەی پێشکەشت کردوە، خێرەکەی لادەبا، یانی: هەندێ خراپەی تایبەت هەندێ چاکەی تایبەت هەڵدەوەشێنێتەوە، بەڵام خراپەکان بەگشتی چاکەکان لانابەن، ئەمەش ڕەحمەت و بەزەیی خوای پەروەردگارە، ئەگەر وا نەبووایە کەمان چاکەمان بۆ نەدەمایەوە، کەواتە: خوا ﷻ بەگتی دەفەرموێ: چاکەکان

خراپەکان لادەبەن، بەڵام خراپەکان بەشێوەیەکی تایبەتو هەندێك لە خراپەکان هەندێ لە چاکەکان لادەبەن نەك بەگشتی.

**مەسەلەی حەوتەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تُبۡطِلُواْ صَدَقَٰتِكُم بِٱلۡمَنِّ وَٱلۡأَذَىٰ ...﴿٢٦٤﴾ ﴾ البقرة، منەتکردن (مَنّ)، تایبەتەو بریتیە لەوەی ڕووبەڕوو منەت لەسەر: خێرپێکراو بکەی، بەڵام ئازاردان (أذَى) گشتییە، چ منەتی لەسەر بکەی، چ توانجی تێبگری، چ دوایی پاشملە باسی بکەی، چ بە هەر شێوەیەك لە شێوەکان ئەزیەتی بدەی، بۆ وێنە: بە شێوەیەك پارەکەی وێبدەی نەفسی پێ بریندار‌بێ، لەپێش چاوی خەڵکی بیدەیە، یان بە هەر شێوەیەك لە شێوەکان هەستی بڕووشێنی، (أذَى) هەر جۆرە ئازاردانێك دەگرێتەوە، بەڵام (مَنّ) تەنیا ئەوەیە کە منەتی بەسەردا بکەی‌و بە چاوی دابدەیەوە، بەڵگەشمان لەسەر ئەوە کە خێرو چاکەکردن لەگەڵ خەڵك بەهۆی ئازاردانیانەوەو بە هۆی منەت لەسەرکردنیانەوە، هەڵدەوەشێتەوە، ئەوەیە کە خوا زۆر بە ڕوون‌و ڕاشکاویی فەرموویەتی: ﴿ كَٱلَّذِي يُنفِقُ مَالَهُۥ رِئَآءَ ٱلنَّاسِ وَلَا يُؤۡمِنُ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِۖ ﴾، واتە: ئەوانەی ئازاری بابای هاوکارییکراو دەدەن‌و منەتی لەسەر دەکەن، وەك ئەوانە وان کە ماڵی خۆیان بە ڕیابازیی خەرج دەکەن، وە بڕوایان بە خواو بە ڕۆژی دوایی نیە، ئنجا بێگومان کەسێك بڕوای بە خواو بە ڕۆژی دوایی نەبێ، یان بە ڕیابازیی شت بکات، دیارە نابێ چاوەڕێی پاداشت بێ، بە هەمان شێوەش کەسێك با لە سەرەتاوە بۆ خواشی کردبێ،. بەڵام دوایی بە هۆی منەتکردن‌و ئازاردانەوە، لەخۆی تێکدەداو نابێ چاوەڕێی پاداشت بێ، ئنجا دواییش خوای بێوێنە، وێنەی هێناوەتەوەو دەفەرموێ: ﴿ فَمَثَلُهُۥ كَمَثَلِ صَفۡوَانٍ عَلَيۡهِ تُرَابٞ فَأَصَابَهُۥ وَابِلٞ فَتَرَكَهُۥ صَلۡدٗاۖ ﴾، واتە: وێنەی وی، وەك وێنەی تاتە بەردێکی لووس وایە، تەنکە گڵێکی بە سەرەوەیە، بارانێکی دڵۆپە زل لێی دەداو هیچی پێوە نامێنێ‌و دەیشواتەوە، مانای وایە ئەو ئازاردان‌و منەتکردنەش، ئاوا

خێرو پاداشتی ئەو چاکەو ئەو ماڵ بەخشینە دەشواتەوە، هەروەها دوایيش، کە دەفەرموێ: ﴿لَّا يَقْدِرُونَ عَلَىٰ شَيْءٍ مِّمَّا كَسَبُوا﴾، {کە مەبەست پێی دواڕۆژە} لە دواڕۆژدا توانایان نابێ بەسەر هیچ لە بەرهەمی ئەو خێرو چاکەیەدا، واتە: هیچیان بۆ نەماوەتەوەو خاوەنی هیچ نابن.

**مەسەلەی هەشتەم:** کە دەفەرموێ: ﴿وَمَثَلُ الَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمْوَالَهُمُ ابْتِغَاءَ مَرْضَاتِ اللَّهِ وَتَثْبِيتًا مِّنْ أَنفُسِهِمْ كَمَثَلِ جَنَّةٍ بِرَبْوَةٍ أَصَابَهَا وَابِلٌ فَآتَتْ أُكُلَهَا ضِعْفَيْنِ فَإِن لَّمْ يُصِبْهَا وَابِلٌ فَطَلٌّ ۗ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ﴾، لێرەدا خوای پەروەردگار وێنەی ماڵ بەخشینی شەرعییانەو ڕاستو تەواو بە چی دێنێتەوە؟ بە باغێك کە لەسەر تەپۆلکەیەکە، لە شوێنێکی بەرزەو بارانێکی باشو بە خوڕزەمو دڵۆپە زل لێی دەدات، بەرەکەی دوو بەرانبەر دەبێتەوە، واتە: ئەگەر هەمان باغ هی کەسێکی دیکەبێ لە شوێنێکی دیکەبێ، نیوەی ئەوە بەردەدا، بەڵام شوێنەکەی هێندە باشەو بارانێکی هێندە چاکی لێ دەبارێو، ئەوەندە خۆری باش پێدەکەوێ، بەرەکەی دوو بەرانبەری باغی خەڵکی دیکە دەبێ.

جا خوا ﷻ دوو هاندەری باسکردوون بۆ کەسێك، کە ماڵ بە شێوەیەکی ڕاستو دروست دەبەخشێ: ﴿ابْتِغَاءَ مَرْضَاتِ اللَّهِ وَتَثْبِيتًا مِّنْ أَنفُسِهِمْ﴾، واتە: ڕەزامەندیی خوا داوا دەکەن، وە لە دڵێکی چەسپاویشەوە یاخود بۆ دڵ چەسپاندنی خۆشیان لەسەر ئیمانو ئیسلام، یان لەسەر ماڵ بەخشینو سەخاوەت، کەواتە: دوو هاندەریان هەن:

**یەکەم:** ئەوەیە کە خوا لێیان ڕازی بێ.

**دووەم:** ئەوەیە کە خۆیان لەسەر سەخاوەتو بەخشین ڕابێنن، یاخود خۆیان پابەند بکەن بەو شەریعەتو بەرنامەوە کە خوای پەروەردگار ناردوویەتی، واتە: هیچ مەبەستێکیان نیە کە زیان بگەیەنن بە بابای خێر پێکراو، ئەو

بابایە کە خێر دەکات، دەڵێ: بۆیە ئەو کارە دەکەم کە خوا لێم ڕازی بێ، وە بۆ ئەوەش کە خۆم مسوڵمانی باشبم‌و سیفەتی باش لە خۆمدا بچەسپێنم، هەڵبەتە ئەو دوو ئامانجەو ئەو دوو پاڵنەرو هاندەرە، کە پاڵ بە بابای ماڵ بەخشەرەوە دەنێن، هیچ زیانێك ناگەیەنن بە لایەنی بەرانبەر.

ئنجا وێنەشی بۆ هێناوەتەوەو دەفەرموێ: ﴿كَمَثَلِ جَنَّةٍ﴾، وێنەی ئەوەی کە ماڵی خۆی لە پێناوی خوادا دەبەخشێ، بۆ ئەوەی خوای لێ ڕازی بێ، وەك باغێکە، چونکە باغ سێبەریشی هەیە، بەریشی هەیە، کەواتە: بابای بەخشندە دەبێ سێبەری هەبێ بۆ خەڵك، وە بەرهەمیشی بۆیان هەبێ.

ئنجا دەربارە شوێنی ئەو باغە دەفەرموێ: ﴿كَمَثَلِ جَنَّةٍ بِرَبْوَةٍ﴾، (رَبْوَةٍ) یانی: تەپۆلکە، بەرزایی، چونکە لەڕووی باغدارییەوە، شوێنی بەرز باشتر تیشکی خۆری تێدەکەوێ‌و ئاوی زۆری تێدا نامێنێتەوە، درەختەکە بن ئاو بکەوێ، ئەوەی بەخشەربێ، دەبێ هەوڵبدا خاوەنی ئەخلاق‌و بەهاو ئەدەبێکی بەرزتربێ‌و، بە ئەخلاقی بەرزو بە بەخشندەیی‌و سیفەتی باش لەنێو خەڵکدا دیاربێ.

ئنجا دوو جۆرە بەخشینی دیاری کردوون، چونکە کە دەفەرموێ: ﴿أَصَابَهَا وَابِلٌ فَآتَتْ أُكُلَهَا ضِعْفَيْنِ فَإِن لَّمْ يُصِبْهَا وَابِلٌ فَطَلٌّ﴾، واتە: ئەو باغە لە دوو حاڵ بەدەر نیە: یان بارانێکی دڵۆپە گەورەو بە خوڕزەمی لێدەداو، ئەو کاتە دوو بەرانبەر بەر دەگرێ ﴿فَإِن لَّمْ يُصِبْهَا وَابِلٌ فَطَلٌّ﴾، وە ئەگەر بارانێکی دڵۆپە زل‌و بە خورزەم‌و بە ڕێژنە لێی نەدا، ئەوە نمە بارانێکی بەسە بۆ بەرگرتن، شوێنەکەی هێندە باشە، ئینسانی مسوڵمانیش دوو حاڵی هەن: یان ئەوەتە ئیمکانیەتی هەیەو خێرو چاکەی زۆر دەکات، یان کەمی هەیەو خێرو چاکەیەکی کەم دەکات، بەڵام هەرچۆن بێ ئینسانی ئیماندار دەبێ هەر بەخشندەبێ، ئەگەر زۆری هەبوو زۆر ببەخشێ‌و ئەگەر کەمیشی هەبوو

کەم ببەخشێ، گرنگ ئەوەیە ئیماندار نابێ چرووك‌و ڕژدو دەست قووچاو بێ، کەمت هەیە کەم ببەخشەو، زۆرت هەیە زۆر ببەخشە، لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ کاتێك پێغەمبەری خوا هانی مسوڵمانانیدا کە ببەخشن لە جەنگی (تەبووك)دا، هەبوو ماڵێکی زۆری دەهێنا پڕی کۆشێك زیوو زێڕی دەهێنا، یاخود پڕی توورەگەیەك زێڕو زیوی دەهێنا، هەشبوو پڕی چنگێکی دەهێنا، وە هەبوو چنگە خورمایەکی دەهێناو دەیگوت: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ هەر ئەوەندەم بۆ کراوە، ئنجا مونافیقەکان ئەوەی زۆری هێنابا دەیانگوت: ئەوە هەر بۆ ڕیایەتی، ئەوەی کەمیشی هێنابا دەیانگوت: جا خوا چ پێویستی بەوەندە هەیە[1] ؟! یانی: هەر چۆن بێ هەر تانەیان دەدا، خوای پەروەردگاریش ئەم ئایەتەی ناردە خوارێ: ﴿ ٱلَّذِينَ يَلۡمِزُونَ ٱلۡمُطَّوِّعِينَ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ فِي ٱلصَّدَقَٰتِ وَٱلَّذِينَ لَا يَجِدُونَ إِلَّا جُهۡدَهُمۡ فَيَسۡخَرُونَ مِنۡهُمۡ ...﴿٧٩﴾ ﴾التوبة، واتە: ئەوانەی {ئەو مونافیق‌و دەغەڵانەی} کە تانەیان دەدا لەو مسوڵمانانەی کە باش ماڵی خۆیان دەبەخشی دەیانگوت ئەوە مەبەستیان پێ خوا نیە {تەماشا ئەو هەموو ماڵ‌و سامانەی بۆچی هێناوە ؟}، وە ئەوانەی هەموو توانای خۆیان دەخستە کارو کەمیان دەهێنا، گاڵتەیان بەوانیش دەکرد! بەڵام نەء، ئەوەی زۆری هەیە با زۆر ببەخشێ، وە ئەوەی کەمیشی هەیە با لە کەمەکەی خۆی هەر ببەخشێ، وە لە فەرمایشتی ڕاست‌و دروست (صحیح)ی پێغەمبەر ﷺیشدا هاتوە فەرموویەتی: {(سَبَقَ دِرهَمٌ أَلْفَ دِرهَمٍ، فَقَالَ رَجُلٌ: وَكَيْفَ ذَاكَ يَا رَسُولَ اللهِ؟ قَالَ: رَجُلٌ لَهُ مَالٌ كَثِيرٌ

---

١) عن أبي مسعود قال: {لما نزلت آيةُ الصَّدقة كُنَّا نُحامِلُ على ظهورنا، فجاء رجُلٌ فتَصدَّق بشيءٍ كثير، فقالوا: مراءٍ، وجاء رجلٌ فتصدَّق بصاعٍ، فقالوا ان الله لَغَنيٌّ عن صدقة هذا، فنزل: ﴿ ٱلَّذِينَ يَلۡمِزُونَ ٱلۡمُطَّوِّعِينَ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ فِي ٱلصَّدَقَٰتِ وَٱلَّذِينَ لَا يَجِدُونَ إِلَّا جُهۡدَهُمۡ ... ﴿٧٩﴾ ﴾التوبة، رواه البخاري: (١٤٥)، ومسلم: (١٠١٨)، والنسائي في التفسير: (٢٤٣)، وابن ماجه: (٤١٥٥)}.

أَخَذَ مِن عرضِهِ مائَةَ أَلفٍ فَتَصدَّقَ بِهَا، وَرَجُلٌ لَيسَ لَهُ إِلاَّ درهَمَانِ فَأَخَذَ أَحَدَهُما فَتَصَدَّقَ بِهِ) (رَوَاهُ ابْنُ حِبَّانَ بِرقم: (٣٣٤٧)، وَالنَّسَائِيُّ بِرقم: (٢٥٢٧)، عَنْ أَبي هُرَيرَةَ ﷺ، وَحَسَّنَهُ الألباني في (صحيح الجامع) بِرقم: (١٨٦٧)}، واتە: درەمێك پێش هەزار درەم کەوتـەوە، پیاوێك گوتی: جا ئەوە چۆنە ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ؟! فەرمووی: کابرایەك هەبوو زۆر دەوڵەمەند بوو {ماڵو سامانێکی زۆری هەبوو} هەزار درەمی لەو ماڵە زۆرەی خۆی کردە خێر، وە پیاوێکیش هەبوو دوو درەمی هەبوون، لەو دوو درەمە یەکێکیانی کردە خێر، خوای کاربەجێ پاداشتی ئەو درەمەی ئەو هەژارو نەدارەی بە زیاتر دایەوە لە هی ئەو هەزار درەمە، بۆچی ؟ چونکە ئەو لە دوو درەمان یەکێکی کردۆتە خێر، ئەوی دیکەش لە ماڵو سامانێکی زۆر هەزار درەمی کردۆتە خێر، دیارە خوای دادگەریش ستەم لە کەس ناکات، بەڵام پاداشتی ئەوەی دیکە کە توانای کەم بووە، زۆر زیاتری داوەتەوە لەوەی دی.

ئنجا بۆیەش لە کۆتایی ئەو ئایەتەدا دەفەرموێ: ﴿ وَٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ بَصِيرٌ ﴾، وە خوا بینەری ئەوەیە کە دەیکەن، چونکە بەخشین کردەوەیە، ئەگەر تێبینیتان کردبێ لە کۆتایی هەموو ئایەتەکاندا خوای خاوەن سیفەتی بەرز، سیفەتێکی خۆی بەیان دەکات، بۆ وێنە دەفەرموێ: ﴿ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴾، ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴾، ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَطِيفٌ خَبِيرٌ ﴾، لێرەدا دەفەرموێ: ﴿ وَٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ بَصِيرٌ ﴾، بۆچی؟ چونکە لە هەر شوێنە خوا سیفەتێکی خۆی بەیان دەکات، کە لەگەڵ ئەو کردەوەیەداو لەگەڵ ئەو شتەدا بێتەوە، لەبەرئەوەی بەخشین کردەوەیە: چۆن دەبەخشێ ؟ چەند دەبەخشێ ؟ بە کێ دەبەخشێ ؟ بابزانێ خوا دەیبینێ.

**مەسەلەی نۆیەم:** کە خوا ﷻ وێنەیەکی هێناوەتەوە بۆ کەسێك کە خێرو چاکە دەکات، بەڵام دوای خێرو چاکەکەی بە ئاودا دەدات، بەهۆی منەتو ئازاردانو

باسکردنو ڕیابازیی یەوە، دەفەرمویٚ: ﴿ أَيَوَدُّ أَحَدُكُمْ أَن تَكُونَ لَهُۥ جَنَّةٌ مِّن نَّخِيلٍ وَأَعْنَابٍ ﴾، واتە: کێتان هەیە خۆزگەو ئاوات بەوە بخوازێ وەك ئەو کەسەبێ، کەسێك کە باغێکی هەیە، ئەو باغە لە درەختی خورماوە بگرە کە بەرزترین درەختە، هەتاکو درەختی مێوو ترێ، کە نزمترین درەختە تێیدایە، نەك تەنیا ئەو دوو درەختەی تێدابێ، وەك دەفەرموێ: ﴿ أَن تَكُونَ لَهُۥ جَنَّةٌ مِّن نَّخِيلٍ وَأَعْنَابٍ ﴾، واتە: لە بەرزترین درەختەوە کە دارخورمایە، تا نزمترینی کە مێوە، درەختی ترێیە، تێیدایە، ئنجا، ﴿ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ ﴾، شاجۆگەو جۆگەلەی زۆری بە بندا دەڕۆن، واتە: پەکی لە ئاوێ ناکەوێ ﴿ لَهُۥ فِيهَا مِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِ ﴾، وە ئەو کەسە لەو باغەی خۆیدا هەموو میوەیەکی هەیە، بۆیە گوتمان کە دەفەرموێ ﴿ مِّن نَّخِيلٍ وَأَعْنَابٍ ﴾، تەنیا مەبستی خورماو ترێ نیە، چونکە ﴿ مِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِ ﴾، هەموو میوەیەك تەنیا لە درەختی خورماو مێو پەیدانابێ، هەنارو خۆخو گێلاسو هەرمێو بەهێ ... ئەوانە، کوا لەو دووانە پەیدا دەبن ؟! کەواتە: هەموو جۆرە میوەیەکی تێدایە، ئەو ڕەزو باغە بەو شێوەیە کە لەوە باشتر نابێ، بەڵام لەو لاوە: ﴿ وَأَصَابَهُ ٱلْكِبَرُ وَلَهُۥ ذُرِّيَّةٌ ضُعَفَآءُ فَأَصَابَهَآ إِعْصَارٌ فِيهِ نَارٌ فَٱحْتَرَقَتْ ﴾، کابرا بۆخۆی کەوتۆتە تەمەنەوەو بەساڵدا چووەو ئینسانی بەساڵداچووش تازە خۆ ناتوانێ دووبارە بچێ باغێکی دیکە بنیات بنێ ! ئنجا کە کەتۆتە تەمەنەوەماڵو منداڵێکی وردو وێرانیشی هەیە، منداڵی سەلکەو پێچکەی هەن ﴿ وَلَهُۥ ذُرِّيَّةٌ ضُعَفَآءُ ﴾، واتە: منداڵەکانی وردنو درشت نین، کە کارو کەسابەت بکەن، ئنجا لەو حاڵەتەدا: ﴿ فَأَصَابَهَآ إِعْصَارٌ فِيهِ نَارٌ فَٱحْتَرَقَتْ ﴾، گەردەلولێك لەو باغە بدا کە ئاگری تێدابێو بسووتێ، کامەتان پێی خۆشە وەزعێکی وای هەبێ ؟ بێگومان کەس

پێی خۆش نیە، کەواتە: ئەگەر چاکەتان کرد وەك ئەو باغە چاکەی ئەو گەردەلولە خراپە لێی دەداتو دەیسووتێنێ، منەت بەسەر خێرپێکراودا مەکەن، وە ئازاری دڵی مەدەنو، خێرو چاکەکە لەخۆتان تێکمەدەن.

**مەسەلەی دەیەم:** کە دەفەرموێ: ﴿كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمُ ٱلْأَيَٰتِ لَعَلَّكُمْ تَتَفَكَّرُونَ ﴾، ئاوا خوا ئایەتەکانیتان بۆ ڕووندەکاتەوە تاکو بیربکەنەوە، ئایا بەبێ بیرکردنەوە ئینسان لە ئایەتەکانی خوا حاڵی دەبێ‌و بەبێ بیرکردنەوە لەو حیکمەتانە دەگەین کە لە ئایەتەکاندا شێرراونەتەوەو، بەبێ بیرکردنەوە لەو ئامانجانە تێدەگەین کە خوای بەخشندە ئەو ئایەتانەی بۆیە ناردوونە خوار کە بهێنرێنە دی ؟! بێگومان نەخێر.

لە کۆتاییدا دەڵێم: وەك زۆر جاری دیش گوتوومانە: قورئان وەك دەریایەکە کە لە دوورەوە تەماشای دەکەی بەس ئاوێکی شین دەبینی، بەڵام کە لێی ورد دەبیەوەو دەچیە سەری ماسی‌و ڕووەك ژیاندارانی دیکەو، پاشان گەوهەرو مرواری تێدا دەبینی، قورئانیش بە هەمان شێوە ئینسان تا چاکتر لێی وردبێتەوە، زیاتر تەفاعولی لەگەڵدا بکات، زیاتر لە نهێنییەکانی تێدەگاتو پێیان ئاشنا دەبێ.

خوای پەروەردگار لەو کەسانەمان بگێرێ کە بەهۆی تێوەرامان‌و زیاتر وردبوونەوەی کتێبی خواوە، زیاتر لێی تێدەگەن زیاتر لە حیکمەتو پەندەکانی حاڵی دەبن، زیاتر لە ئامانجەکانی شارەزا دەبن‌و پاشان باشتر پێوەی پابەند دەبن، لە ژیانی تاکیی‌و خێزانیی‌و کۆمەڵایەتیی‌و سیاسییاندا.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی پەنجاو پێنجەمین

## پێناسەی ئەم دەرسە

خوا پشتیوان بێ لەم دەرسەماندا هەشت (٨) ئایەت لە سوورەتی (البقرة)دا دەتوێژینەوە، کە ئایەتەکانی ژمارە (٢٦٧ تاکو ٢٧٤)ن، خوا ﷻ لەم هەشت ئایەتەدا بۆمان باسی ماڵ بەخشین دەکات: چ جۆرە ماڵێك ببەخشرێ ؟ بە كێ ببەخشرێ ؟ چۆن ببەخشرێ؟ ئەم سێ مەسەلە گرنگە تیشکیان خراوەتە سەر، وێڕای چەندین مەسەلەی دیکە کە پەیوەستن بەم سێ مەسەلە سەرەکییەوە، وەك: بەخشینی شتی باش و پەسەند، خۆ دوورگرتین لە ڕژدیی، لێزان (حكيم) بوون لە بەخشیندا، نەزرکردن، ئاشکراکردن و پەنهانکردنی بەخشین، هەر کامیان لە شوێنی خۆیدا، بەر لە هەرکەس بەخشین بە کەسانی هەژاری بێدەرەتان کە بەهۆی جەنگ و جیهادو کاری ئیسلامییەوە دەرفەتی کارو کاسبیان نیە...هتد.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَنفِقُواْ مِن طَيِّبَٰتِ مَا كَسَبْتُمْ وَمِمَّآ أَخْرَجْنَا لَكُم مِّنَ ٱلْأَرْضِ ۖ وَلَا تَيَمَّمُواْ ٱلْخَبِيثَ مِنْهُ تُنفِقُونَ وَلَسْتُم بِـَٔاخِذِيهِ إِلَّآ أَن تُغْمِضُواْ فِيهِ ۚ وَٱعْلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ غَنِىٌّ حَمِيدٌ ﴿٢٦٧﴾ ٱلشَّيْطَٰنُ يَعِدُكُمُ ٱلْفَقْرَ وَيَأْمُرُكُم بِٱلْفَحْشَآءِ ۖ وَٱللَّهُ يَعِدُكُم مَّغْفِرَةً مِّنْهُ وَفَضْلًا ۗ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ ﴿٢٦٨﴾ يُؤْتِى ٱلْحِكْمَةَ مَن يَشَآءُ ۚ وَمَن يُؤْتَ ٱلْحِكْمَةَ فَقَدْ أُوتِىَ خَيْرًا كَثِيرًا ۗ وَمَا يَذَّكَّرُ إِلَّآ أُوْلُواْ ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿٢٦٩﴾ وَمَآ أَنفَقْتُم مِّن نَّفَقَةٍ أَوْ نَذَرْتُم مِّن نَّذْرٍ فَإِنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُهُۥ ۗ وَمَا لِلظَّٰلِمِينَ مِنْ أَنصَارٍ ﴿٢٧٠﴾ إِن تُبْدُواْ ٱلصَّدَقَٰتِ فَنِعِمَّا هِىَ ۖ وَإِن تُخْفُوهَا وَتُؤْتُوهَا ٱلْفُقَرَآءَ فَهُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ ۚ وَيُكَفِّرُ عَنكُم مِّن سَيِّـَٔاتِكُمْ ۗ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ ﴿٢٧١﴾ لَّيْسَ عَلَيْكَ هُدَىٰهُمْ

وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يَهْدِي مَن يَشَآءُۗ وَمَا تُنفِقُواْ مِنْ خَيْرٍ فَلِأَنفُسِكُمْۚ وَمَا تُنفِقُونَ إِلَّا ٱبْتِغَآءَ وَجْهِ ٱللَّهِۚ وَمَا تُنفِقُواْ مِنْ خَيْرٍ يُوَفَّ إِلَيْكُمْ وَأَنتُمْ لَا تُظْلَمُونَ ﴿٢٧٢﴾ لِلْفُقَرَآءِ ٱلَّذِينَ أُحْصِرُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ لَا يَسْتَطِيعُونَ ضَرْبًا فِي ٱلْأَرْضِ يَحْسَبُهُمُ ٱلْجَاهِلُ أَغْنِيَآءَ مِنَ ٱلتَّعَفُّفِ تَعْرِفُهُم بِسِيمَٰهُمْ لَا يَسْـَٔلُونَ ٱلنَّاسَ إِلْحَافًاۗ وَمَا تُنفِقُواْ مِنْ خَيْرٍ فَإِنَّ ٱللَّهَ بِهِۦ عَلِيمٌ ﴿٢٧٣﴾ ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمْوَٰلَهُم بِٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ سِرًّا وَعَلَانِيَةً فَلَهُمْ أَجْرُهُمْ عِندَ رَبِّهِمْ وَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿٢٧٤﴾ ﴾

## مانای وشە بە وشەی ئایەتەکان

((ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! لەو سامانە باشانەی کە بە دەستتان هێناون‌و لەوەی کە بۆمان لە زەوی دەرهێناون، ببەخشن، وە بۆ خراپەکەی مەگەڕێن، لێی دەبەخشن، بەڵام بەچاو لێنووقاندنەوە نەبێ وەری ناگرن، وە بزانن کە خوا بێ نیازی ستایش کراوە ﴿٢٦٧﴾ شەیتان لە نەداریی دەتانترسێنێ‌و بە ڕژدیی فەرمانتان پێ دەکات، بەڵام خوا گفتی لێبوردن‌و بەخششی خۆیتان پێ‌دەدا، وە خوا (بەخشش) فراوانی زانایە ﴿٢٦٨﴾ حیکمەت بە هەرکەسێك دەدا کە بیەوێ، وە بێگومان هەرکەسێك حیکمەتی پێبدرێ، ئەوە خێرو چاکییەکی زۆری پێدراوە، بەڵام خاوەن عەقڵان نەبێ پەند وەرناگرن ﴿٢٦٩﴾ وە هەر ماڵێك ببەخشن یان هەر شتێك لەخۆتان بگرن (نەزری بکەن) ئەوە مسۆگەر خوا دەیزانێ، وە ستەمکارانیش هیچ پشتیوانیان نین ﴿٢٧٠﴾ ئەگەر خێرو چاکەکانتان ئاشکرا بکەن، ئەوە چاکترین شتە، وە ئەگەر پەنهانیان بکەن‌و بیاندەنە هەژاران ئەوە بۆ خۆتان باشترە، وە بەشێك لە خراپەکانتان لێ دەسڕێتەوە، وە خوا بە هەرچی دەیکەن شارەزایە ﴿٢٧١﴾ هێنانە سەر ڕێی ڕاستیان لەسەر تۆ نیە، بەڵام خوا هەر کەسێکی بوێ دەیخاتە سەر ڕێی ڕاست، وە هەر ئەندازەیەك لە خێرو چاکە بکەن، ئەوە سوودەکەی بۆخۆتانە، وە

(ئێـوە) بەمەسـتی وەدەسـتهێنانی ڕەزامەنـدیی خـوا نەبـێ نابەخـشن، وە هـەر ئەندازەیەك ماڵ ببەخشن، بێ ئەوەی ستەمتان لێبکرێ دەتـانلرێتەوە ﴿٢٧٢﴾ (بـا ماڵ بەخشینتان) بۆ هەژارانێك بێت کە لەڕێی خوادا ڕێ لێ بەسـتراون‌و ناتـوانن بەزەویدا (بۆ کاسبی) بێن‌و بچن، بابای نا ئاشنایان لەبەر زێدە نەفس بەرزیی، بە دەوڵەمەنـدیان تێـدەگات، (بـەڵام ئەگـەر بـاش سـەرنجیان بـدەی) بـە نیـشانەیان دەیانناسی (کە هەژارن) بە مکووڕیی‌و سووربوونەوە شت لە خەڵکی داواناکەن، وە هەر شتێکیش لە ماڵ ببەخشن، بێگومان خوا پێی زانایە ﴿٢٧٣﴾ ئەوانەی کە بە شەوو ڕۆژو بە پەنهانیی‌و ئاشکرا سامانەکانیان دەبەخشن، ئەوە بێگومان پاداشتی تەواوی خۆیان لەلای پەروەردگاریان هەیەو نە ترسیان لەسەرەو نە خەمباریش دەبن ﴿٢٧٤﴾)).

## شیکـردنەوەی هـەندێـك لە وشـەکان

(أَنفِقُواْ): واتە: ببەخشن (نَفَقَ الشَيءُ: مَضَى وَنَفِدَ، الإِنْفَاقُ: قَدْ يَكُونُ فِي الـمَالِ، وغَيرِهِ، وَقَدْ يَكونُ واجِباً وتَطوُّعاً)، (نَفَقَ) واتە: تێپەڕی‌و تەواوبوو، بەخشینیش لە ماڵ‌و غەیری ماڵ دایەو جاری وا هەیە فەرزەو جاری واش هەیە سوننەتە.

(طَيِّبَٰتِ): کۆی (طَيِّبَةَ)یە، (طَيِّبَةَ) واتـە: زۆر چاك‌و سـوودبەخش‌و زۆر بەتـام‌و خۆش، دەگوترێ: (طَابَ الشَيءُ يَطِيبُ طَيْبَاً فَهُوَ طَيِّبٌ) واتە: شـتەکە خۆشە یان بەسوودە، یـان چاکە (فَهُوَ طَيِّبٌ) (طَيِّبٌ) واتـە: شتی بـاش‌و بەلـەززەت‌و خۆش‌و بەکەڵك (وأَصْلُ الطَّيِّبِ: مَا تَسْتَلِذُّهُ الحَوَاسُّ ومَا تَسْتَلِذُّهُ النَّفْسُ) لـە بنـچینەدا (طَيِّب) هـەر شـتێکە کـە هەسـتەکان تـامی لێـوەربگرن، بـۆنێکی خـۆش، تـامێکی خـۆش، ڕەنگێکـی جـوان، دەنگێکـی خـۆش، هـەموو پێیـان دەگوترێ: (طَيِّب)، هەموو ئـەو شـتانەی کـە خۆشـن، وە هەرشـتێك کـە نەفـس لەززەتـی لێبکات، (طَيِّب)یان بۆ بەکاردێ.

(كَسَبْتُمْ): واتـە: بەدەستتان هێناوە، چونکە (كَسَبَ يَكْسِبُ) واتـە: وەدەسـتی هێنـا، وەدەسـتی دێنـێ.

(وَلَا تَيَمَّمُواْ)؛ واتــە: (وَلاَتقـصُدُوا) مەبەســتتان نــەبێ، لــێی مەخــەفتێن، ﴿ وَلَا تَيَمَّمُواْ ٱلۡخَبِيثَ ﴾، واتە: کە خێر دەکەن لێی مەخـەفتێن کام شتەی بەکەڵـك نایە، ئەوە بکەنە خێـر، ئەوەی کە بۆخۆتـان ناتـانـەوێ، (تَيَمُّمْ)یش هەر بۆیـە پێی دەگوترێ: (تَيَمُّمْ) وەك فەرموویەتی: ﴿ ... فَتَيَمَّمُواْ صَعِيدًا طَيِّبًا... ۝٦ ﴾ المائدة، واتە: بگەڕێن‌و بخەفتێن لە گڵێکی پاك، ئەسڵی وشەی (تَيَمُّمْ) ئەوەیـە کـە تۆ بخـەفتـێی‌و بگـەڕێی لە گڵێکی پــاك.

(ٱلۡخَبِيثَ)؛ (الخُـبْثُ والخَبِيـثُ: مـا يُكْـرَهُ رَدَاءَةً وَخِـسَاسَةً، مَحْـسُوسَاً كَـانَ أَو مَعْقُولاً)، (الخُبْثُ) و (الخَبِيثُ): هەر شتێکە کە لەبەر خراپیی نەویستـرێت، جا شتێکی بەرهەست بێ، یاخود لـەڕووی مەعنەوییـەوە بەکـەڵك نـەهاتووبێ، (الخَبائِـث جَمْـعُ الخَبِيـث: مَـا لاَيُوَافِـقُ الـنَّفسِ مِـن الـمَحْظُـورات)، واتــە: (خَبَائِث) کـۆی (خَبِيث)ە‌و هەر شتێکـە کە لـەگـەڵ سروشـتی ئینـسان سازگـار نەبێ‌و ئینسان پێـی خۆش نەبێ‌و پێی چاك نەبێ.

(إِلَّآ أَن تُغۡمِضُواْ فِيهِ)؛ مەگــەر چــاوی لــێ بنــووقێنن، ﴿ وَلَسۡتُم بِـَٔاخِذِيهِ إِلَّآ أَن تُغۡمِضُواْ فِيهِ ﴾، واتە: ئەگـەر بدرێ بە خۆتان وەریـناگـرن، مەگەر چاوی لـێ بنـووقێنن، واتـە: مەگــەر لەبـەر خـاتری خاتـران، یـان بـە ناچـاریی ئەگـەرنا ئامادە نین شتی خراپ وەربگرن، کەواتە: شتی خراپیش مەکەنە خێر چونکە، ﴿ تُغۡمِضُواْ فِيهِ ﴾، دەڵێ: (الغُمْضُ: النَّوْمُ العَارِض) نووستنێکە کە بەسەرتدا دێ، (وغَمَـضَ عَيْنَـهُ وَأَغْمَضَهَا وضَـعَ إِحـدى جَفْنَتَـيْهِ عَلَـى الأُخـرَى) واتــە: پێڵـووی چـاوی لەسـەر پێڵـووەکەی دیکە دانـا، چـاوی نووقانـد، (ثُمَّ يُسْتَعَـارُ للتَّغَـافُل وَالتَّسَاهُل) دوایی خواستـراوەتـەوە بۆ شـتێك کە بە ناچاریی، یاخود وەك بڵێی لەبەر خـاتران، وەریـدەگری ئەگەرنا وەریـناگـری.

(يَعِدُكُمُ)؛ واتــە گفتتــان پــێ دەدا، ﴿ وَٱللَّهُ يَعِدُكُم مَّغۡفِرَةً مِّنۡهُ وَفَضۡلًا ﴾، وشــەی (يَعِدُكُم) لە (وعد)ەوە هـاتوە، (الوَعْدُ يَكُونُ فـي الخَـيْرِ والـشَّرِّ وفـي الْخَيْر

أَكْثَر)، وە (وَعْد) لە خێریشدا بەکاردێ لە شەڕیشدا، بەڵام زیاتر بۆ خێرو چاکە بەکاردێ، دەڵێ: وەعدی پێداوە، واتە: بۆ چاکە، بەڵام بۆ خراپە (وَعِيدُ) هەیە (أوعَدَهُ) واتە: هەڕەشەی لێ کرد (وعید) هەڕەشەیە (وعد) بەڵێندان و گفت دانە بۆ شتی باش.

(بِٱلْفَحْشَآءِ)؛ هەر کردەوەیەکی ناقولایەو هەر قسەیەکی خراپە، دەڵێ: (الفُحْشُ وَالفَحْشَاءُ وَالفاحِشَةُ: مَاعَظُمَ قُبْحُهُ مِنَ الأَفْعَالِ والأَقْوَالِ وَيُقْصَدُ بِهِ هُنَا البُخْلُ) وشەی (الفُحْشُ) وە (الفَحْشَاءُ) وە (الفاحِشَةُ) هەر قسەیەکەو هەر کردەوەیەکە کە زۆر ناقولاو دزێوو نارێك بێ، بەڵام لێرەدا مەبەست لە (الفَحْشَاءِ)، واتە: چرووکیی و ڕژدیی و چنگ نووقاندن.

(أُوْلُواْ ٱلْأَلْبَٰبِ)؛ واتە: (أصْحَاب العقول) خاوەن عەقڵان، چونکە (ألبَاب) کۆی (لُبّ)ە و ئەمیش واتە: کاکڵ، بەڵام لە قورئاندا بەکارهێنراوە بۆ عەقڵ، بۆچی؟ چونکە وەك چۆن میوەیەك بەس بە هۆی کاکڵەکەیەوە بە کەڵك دێ، ئینسانیش هەر بەهۆی عەقڵەکەیەوە بەکەڵك دێ و، ئینسان بە عەقڵ لە ئاژەڵ و ژیانداران جیادەبێتەوە، جا دەڵێ: (اللُّبُّ: العَقْلُ الخَالِصُ مِنَ الشَّوَائِبِ)، (لُبّ): بریتیە لە عەقڵێ کە ساغ بووبێتەوە لە خڵتە، وە بۆیەش وای ناو لێنراوە، چونکە هەر عەقڵە لە ئینساندا کە ئینسان بکات بە ئینسان، وە جیای بکاتەوە لە غەیری خۆی، وەك چۆن میوەیەکیش لەبەر کاکڵەکەی دەویسترێ، ئەگەرنا توێکڵەکەی کەس نایەوێ.

(نَّفَقَةٍ)؛ (النَّفَقَةُ: اسمٌ لِما يُنْفَقُ)، (نفقة): ناوە بۆ هەر شتێك کە ببەخشرێ، پارەبێ، ماڵ بێ، خواردن بێ، بەرگ بێ، زەوی بێ، هەر شتێك ببەخشرێ وشەی: نەفەقەی بۆ بەکاردێ.

(نَذَرْتُم)؛ واتە: نەزرتان کردبێ، لە خۆتان گرتبێ (النَّذْرُ: أنْ تُوجِبَ عَلَى نَفْسِكَ مالَيسَ بِوَاجِبٍ)، (النَّذْرُ): ئەوەیە تۆ شتێك لەسەر خۆت پێویست بکەی کە لەسەرت پێویست نەبێ، وەك لە قورئاندا هاتوە: ﴿...إِنِّي نَذَرْتُ

لِلرَّحۡمَٰنِ صَوۡمٗا ... ﴿٢٦﴾ مريم، من بۆ خوای خاوەن بەزەیی ڕۆژووم لەخۆم گرتوە.

(فَنِعِمَّا هِيَ): واتە: باشترین شت ئەوەیە، ئەسڵی خۆی ئەم وشەیە (فَنِعْمَ ماهِيَ)یە، واتە: ئا ئەو کارە ئەو شتە باشترین شتە (ونِعْمَ: كَلِمَةُ المَدْحِ في مقابل بِئسَ للذم)، عەرەب ئەگەر بیانەوێ شتێك مەدح بكەن، دەڵێن: (نِعْمَ) بۆ وێنە: (نِعْمَ الرَّجُلُ مُحَمَّدٌ) موحەممەد باشترین پیاوە (بِئسَ)ەش، بۆ زەممە، وەك: (بِئْسَ الرَّجُلُ زَيْدٌ) خراپترین پیاو زەیدە.

(خَيۡرٞ لَّكُمۡ): واتە: بۆ ئێوە چاكترە (الخَيْرُ: ما يَرْغَبُ فيهِ الكُلُّ، وَضِدُّهُ الشَرُّ)، (خَيْر) هەر شتێكە كە هەموو لایەك ئارەزووی بكەن، پێچەوانەی (شَرّ)ە، واتە: خراپ یان خراپتر.

(هُدَىٰهُمۡ): (الهُدى: دِلالَةُ بِلُطفٍ) واتە: ڕێنمایییان خستنە سەر ڕێ بە شێوەیەكی نەرمو هێدیی.

(وَجۡهِ ٱللَّهِ): بە چەند واتایەك هاتوە: خۆی (وجه) واتە: ڕوو (وجه الله) واتە: ڕووی خوا، بەڵام لێرەدا یان مەبەست پێی ڕەزامەندیی خوایە (مَرْضَاة الله)، یان مەبەست پێ زاتی خوایە (ذَات الله)، یان مەبەست پێ دیداری خوایە (لِقَاء الله)، یان مەبەست پێ ڕووی خوایە، واتە: سیفەتێك بۆ خوا، كە بۆ خوا شایستەیە، ڕووی خوا، ئەگەر سیفەت بێ دەڵێین: سیفەتێكە كە بۆ خوا شایستەیەو، وەك هی دروستكراوەكان نییە.

(يُوَفَّ إِلَيۡكُمۡ): واتە: بەتەواویی دەتانلدرێتەوە، چونكە دەڵێ: (الوَافي: الّذِي بَلَغَ التَّمَامُ)، (وَافي): واتە شتێك كە تەواوبووبێ (وأوفى: إذَا تَمَّمَ العَهْدَ وَلَمْ يَنْقُضْ حِفْظَهُ) واتە: پەیمانەكەی تەواوكردو هەڵینەوەشاندەوە، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ وَإِبۡرَٰهِيمَ ٱلَّذِي وَفَّىٰٓ ﴿٣٧﴾ ﴾ النجم ، واتە: ئیبراهیمێك كە بەتەواویی جێبەجێی كرد، چی جێبەجێ كرد ؟ پەیمانێك كە بە خوای دابوو.

(﴿لِلْفُقَرَآءِ﴾): واتە: هەژاران، لە قورئاندا دوو وشە بەکارهاتوون: (فُقَرَاء)و (مَسَاكِين)، من (فَقِير)م بە هەژار لێكداوەتەوەو (مسكين)یش بە نەدار، چونکە دەڵێ: (أصْلُ الفَقِير: المكسورُ الفِقَار)، (فَقِير) لە ئەسڵدا ئەوەیە کە بڕبڕەی پشتی شکابێ (يُقَالُ: فَقَرْتُهُ فاقِرَةٌ) واتە: شتێك پشتی شکاند، کەواتە: هەژار کەسێکە هیچی نیە، وەك چۆن کەسێك کە پشتی دەشکێ ناجووڵێ‌و ئیفلیج دەبێ، بابای هەژاریش هیچی نیەو هیچی لە دەست نایێ، (مسكين)یش نەدارە، واتە: کەسێك کە شتێکی هەیە بەڵام بەشی ناکات، چونکە خوا ﷻ لە سوورەتی (الکهف)دا دەفەرموێ: ﴿أَمَّا ٱلسَّفِينَةُ فَكَانَتْ لِمَسَٰكِينَ يَعْمَلُونَ فِى ٱلْبَحْرِ... ﴿٧٩﴾﴾، واتە: بەڵام کەشتییەکە هی کۆمەڵێك نەدار بوو کە ئیشیان دەکرد لە دەریادا، کەواتە دیارە کۆمەڵێك خەڵك بوون، کەشتییەکیان هەبووە، کەواتە: (مسكين) کەسێکە شتێکی هەیە، بەڵام بەشیی ناکات، بەس (فَقِير) ئەوەیە کە هیچی نیە.

(﴿أُحْصِرُواْ﴾): واتە: ڕێیان لێگیراوە (الحَصرُ: التَضييقُ)، (حَصْر) واتە: تەنگ پێ هەڵچنین (حَصيراً، أي: حَابِساً، فالإحْصَارُ يُقَالُ: في المَنْعِ الظَاهر والباطن) شتێك شتێك حەپس بکات، جا وشەی: (إحْصَار) چ بە ڕواڵەت ڕێی لێگیرا بێ، چ بە پەنهانیی هەردووکی دەگرێتەوە.

(﴿ضَرْبًا فِى ٱلْأَرْضِ﴾): واتە: بە زەویدا بڕۆن، بۆچی وا گوتراوە؟ دەڵێ: (الضَّرْبُ إيقاعُ شَيءٍ عَلَى شَيءٍ، والضَّرْبُ في الأرض الذهاب فيها وضَربها بالأرجُل)، (ضرب) بریتیە لەوەی شتێك لە شتێك بدەی، ئەوە پێی دەگوترێ: (ضرب) جا لەبەرئەوەی کەسێك کە بە زەویدا دەڕوا دەبێ پێ بە زەویدا بدات، بۆیە (ضرباً في الأرض) واتە: بە زەویدا ڕۆیشتن.

(﴿ٱلْجَاهِلُ﴾): بە مانای نەفام یان نەزان دێ، بەڵام لێرەدا (غَير العَارف أي: مَن لايَعْرِفُ حالَهم) واتە: کەسێك کە نایاننناسێ، بابای نا ئاشنا، باسی ئەو

هەژارە ئیماندارانە دەکات، کە لەبەر نەفس بەرزیی کەسێك کە نەیانناسێ، بە دەوڵەمەندیان تێدەگات، چونکە هێندە نەفس بەرزن، خۆیان بە فەقیرو رووتو رەجاڵ پێشان نادەنو، کەسێك کە پێیان ئاشنا نەبێ، بە دەوڵەمەندیان تێدەگات، بەڵام ئەوەی بیانناسێ لە نزیکەوە دەزانێ وەزعیان چۆنە.

(ٱلتَّعَفُّفِ): ﴿ يَحْسَبُهُمُ ٱلْجَاهِلُ أَغْنِيَآءَ مِنَ ٱلتَّعَفُّفِ ﴾، (التَّعَفُّف) لە (عِفَّة)ەوە هاتوە (العِفَّةُ: حُصولُ حَالَةٍ لِلنَّفْس تَمْتَنِع بِهَا عَنْ غَلَبَةِ الشَّهْوَةِ) دەڵێ (العِفَّة) واتە: (عِفَّة) حاڵەتێکە بۆ نەفس پەیدادەبێ، کە بەهۆی ئەو حاڵەتەوە نەفس بەدوای ئارەزوو ناکەوێ، جا ئینسانی عەفیف، بە داوێن پاك دەگوترێ کە ئارەزووی خۆی کۆنترۆڵ کردوە، وە ئینسانی عەفیف بە ئینسانی نەفس بەرز دەگوترێ، کە چاوی لە دەستی خەڵك نیە، کەواتە: ئینسانی عەفیف، واتە: هەرکەسێك کە خۆی پاك رادەگرێو بە دوای ئارەزووان ناکەوێ، (تعفف)یش لەسەر وەزنی (تَفَعُّل) واتە: کەسێك خۆی مەرزەم دەکاتو خۆی کۆنترۆڵ دەکاتو خۆی پاك رادەگرێ.

(بِسِيمَٰهُمْ): واتە بە نیشانەیان (سِيما) واتە: نیشانە (السيماء والسيمياء: العَلاَمَةُ، و سَوَّمْتُهُ أَعْلَمْتُهُ)، (سيماء وسيمياء) واتە: نیشانە (سَوَّمْتُهُ: أَعْلَمْتُهُ) واتە: نیشانەدارم کرد.

(إِلْحَافًا): (أي إلحَاحًا) (إلحَاف) واتە: شتێك کە زۆر بە سووریی داوای بکەیو زۆری لەسەر بچی (وَأَصْلُ الإلحَافِ مِنَ اللِّحَاف الَّذي يُغْطَّى بِهِ) ئەسڵی وشەی (إلحَاف) لە (لِحاف)ە، واتە: لێفە، ئەوەی ئینسان خۆی پێ دادەپۆشێ، وەك بڵێی ئەو کەسەی کە زۆر داوا دەکات، وەك لێفەیەکی وایە پێیەوە لکابێو لە کۆڵت نەبێتەوە.

## هـۆی هاتنــە خوارەوەی ئایەتەکــان

١) هـۆی هاتنـە خـوارەوەی ئـەو ڕستە قورئانییـەی کـە دەفـەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَنفِقُواْ مِن طَيِّبَٰتِ مَا كَسَبۡتُمۡ وَمِمَّآ أَخۡرَجۡنَا لَكُم مِّنَ ٱلۡأَرۡضِ ﴾ {(عَنِ البَراءِ بْنِ عَازِبٍ ﷺ قَالَ: نَزَلَتْ فِينَا مَعْشَرَ الأنصار، كُنَّا أصْحَابَ نَخْلٍ فَكَانَ الرَّجُلُ يأتي مِن نَخْلِهِ عَلَى قَدْرِ كَثْرَتِهِ وقِلَّتِهِ، وَكَانَ الرَّجُلُ يأتي بالقِنوِ والقِنوينِ فَيُعَلِّقُهُ في المسجدِ، وَكَانَ أهلُ الصُّفَّةِ لَيْسَ لَهُم طَعَامٌ، فَكَانَ أَحَدُهُمْ، إذَا جَاءَ أَتَي القِنوَ فَضَرَبهُ بعَصَاهُ فيسقط مِن البُسْرِ وَالتَّمْرِ فيأكُلُ، وَكَانَ نَاسٌ مِمن لا يرغبُ في الخَيرِ يأتي الرَّجُلُ بالقِنوِ فيه الشيصُ والحَشَفُ وبالقنوِ قَدْ انكسرَ فَيُعَلِّقُهُ، فأنزَلَ اللهُ تعالى: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَنفِقُواْ مِن طَيِّبَٰتِ مَا كَسَبۡتُمۡ وَمِمَّآ أَخۡرَجۡنَا لَكُم مِّنَ ٱلۡأَرۡضِۖ وَلَا تَيَمَّمُواْ ٱلۡخَبِيثَ مِنۡهُ تُنفِقُونَ وَلَسۡتُم بِـَٔاخِذِيهِ إِلَّآ أَن تُغۡمِضُواْ فِيهِۚ ... ﴾، قَالَ: لَو أنَّ أحَدَكُم أُهْدِيَ إليهِ مِثْلُ ما أَعْطَاهُ، لَمْ يأخُذْهُ إلاَّ عَلَى إغمَاضٍ وحَيَاءٍ، قَالَ: فَكُنَّا بَعْدَ ذلك يأتي أَحَدُنَا بِصَالحِ ماعِنْدَهُ) (رَوَاهُ ابْنُ جَرِير، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٢٩٨٧)، وَصَحَّحَهُ، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (١٨٢٢)، وَابْنُ أبي حاتِم، وَالحَاكِمُ وَصَحَّحَهُ البَيْهَقِيُّ وَابْنُ المُنذِروَابْنُ أَبي شيبة وعَبْد بْنُ حُمَيد، وَصَحَّحَهُ الألباني}، واتـە: بەرائی کوڕی عازیـب خـوای لـێ ڕازی بێ دەڵێ: ئـەم ئایەتـە لەسـەر ئێمـە هاتـەخوار، ئێمـەی کۆمـەڵی پـشتیوانان خـاوەنی بـاغی خورمـا بـووین، پیاوێـك لـە ئێمـە دەچـووە لای باغـە دارخورمایەکـانی، ئـەوەی کـە زۆری هەبووایـەو ئـەوەی کـە کەمی هەبووایە، کابرا هێشوویەکی دەهێنـا، یـان دوو هێـشووی دەهێنـا {(قِنو) واتـە: هێشووی خورما} لە مزگەوتی هەڵیدەواسی وە ئەهلـی (صفة) {(صفة) شـوێنێك بـووە بـەر هـەیوانێك بـووە شـوێنێکی بـەرز بـووە ئەوانـەی کـە مـاڵو حاڵیـان نـەبووەو نـەدارو هـەژار بوونو لـەوێ بوون} ئەوانـە هـیچ خواردنیـان

نەبووە، یەکێك لەوانە ئەگەر برسی بووایە دەهات ئەو هێشووە خورمایە کە هەڵواسراوە بە گۆچانەکەی لێی دەداو هەندێك فەریکە خورما یاخود خورمای گەیشتوو، دەکەوتنە خوارێو دەیخواردن، جا کەسانێك هەبوون لەوانەی زۆر ئارەزوویان لە خێرو چاکە نەبوو، پیاوێك لەوان دەچوو هێشوویەکی دەهێنا کە خورمای بێکەڵك یان خورمای ڕەقو تەقو نەگەیشتوو، یان هێشوویەك کە شکابوو ئەوەی دەهێناو هەڵیدەواسی {واتە: خورمایەك کە بۆخۆی پێ ڕازی نەبووو بەکەڵك نەدەهات}، ئیدی خوای پەروەردگار لەوبارەوە ئەو ئایەتەی نارده خوارێ: (ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە ! لەو ڕۆزییە پاكو چاکانەی وەدەستتانهێناوەو لەوەی لە زەوی بۆمان دەرهێناون ببەخشن، وە مەخەفتێن بۆ ئەو شتەی کە بە کەڵك نایە {جا ئەوە لێرەدا دەربارەی خورما ئەو بەسەرهاتە دەگێڕێتەوە، بەڵام هەموو شتێکی دیکەش هەر وایە، مرۆڤ بۆ وێنە: دەیەوێ مەڕێکی بکاتە خێر، با نەگەرێ کام مەڕی لاوازەو نەخۆشەو بەکەڵك نایە ئەوی بکاتە خێر، یاخود یەکێك بەرگو پۆشاك دەکاتە خێر، یان پارە دەکاتە خێر، یان دەغڵ دەکاتە خێر، هەر شتێك دەکاتە خێروچاکە، با بۆکامەی خراپە بۆ ئەوە نەگەرێ بەڵکو شتی باش ببەخشێ، کە بۆخۆی پێی چاکە، ئەگەر بیدرێتێ کامەی پێ چاکە بۆخۆی، با لە هەمان شتیش بدات بە خەڵکی}.

جا بەڕاء دەڵێ: بە دوای ئەوەی ئەم ئایەتە هاتە خوارێ، ئێمە کامە ماڵی باشمان هەبوو ئەومان دەهێنا پێشێ، کە ئایەتەکە نەهاتبووە خوارێ هەموو نەوعی تێدا هەبووە، هەبووە هی چاکی هێناوەو هەبووە هی خراپ، بەڵام دوای ئەوە کەس شتی خراپی نەدەهێنا، خوا لێیان ڕازی بێ ئەوانە وەختێ خوای باڵادەست شتێکی پێ فەرموون، یەکسەر جێبەجێیان کردوە.

٢) هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو ئایەتەی، کە دەفەرموێ: ﴿لَّيْسَ عَلَيْكَ هُدَىٰهُمْ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يَهْدِى مَن يَشَآءُ﴾، ڕێنماییکردنی ئەوان، یان خستنە سەر ڕێی ئەوان، لەسەر تۆ نیە (ئەی پێغەمبەر) بەڵکو خوا هەرکەسێك بیەوێ ڕێنمایی دەکا، لەوبارەوە چەند شتێك باسکراوە:

أ- یەكێكـــیان: {(عَـنْ ابـنِ عَبَّـاسٍ رضي الله عنه قَـالَ: كَـانوا يَكْــرَهونَ أَنْ يَرضَــخوا لأنـسابِهِم مِـن الـمُـشرِكِينَ، فَنَـزَلَتْ هـذِهِ الآيـة: ﴿ لَّيْسَ عَلَيْكَ هُدَىٰهُمْ ﴾، إلـى قَولِهِ: ﴿ وَأَنتُمْ لَا تُظْلَمُونَ ﴾ فَرَخَّصَ لَهُم)، رَوَاهُ الحَـاكِمُ بـرقم: (٧٢٦٤) وَصَحَّحَهُ، وَالبَيْهَـقِيُّ، وَالـضياء فـي الـمُختـارة، وَصَحَّـحَهُ الألبـاني}، واتـه عەبـدوڵڵای كوڕی عەببـاس خـوا لـه خـۆیو بـابی ڕازی بـێ دەڵـێ: مـسوڵمانان {هـاوەڵانی پێغەمبـەر ﷺ خـوا لێیـان ڕازی بـێ} پێیـان نـاخۆش بـوو مـاڵی خۆیان ببەخشن بە خزمەكانیـان لەوانەی كە كافرو بت پەرست بوون، خـوای دادگەریش ئەم ئایەتـەی نـاردە خواریو مۆڵـەتیدا.

ب- هەروەها ئەم دەقـەش لەوبارەوە هاتوە: {(عَـنْ ابـنِ عَبَّـاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنهُمـا قَـالَ: إنَّ النَّبِــيَّ ﷺ كَانَ يأمُرُنـا أنْ لاَ نَتَصَـدَّق إلاَّ عَلَـى أَهْـلِ الإسلامِ، حَتَّـى نَزَلَـتْ هَذِهِ الآيـة، فأمَرَ بالصَدَقَةِ بَعْدَهـا عَلَـى كُلِّ مَن سأَلَـكَ مِن كُلِّ دين) (رَوَاهُ ابنُ أبي حـاتم وإبن مردَوَيْهِ والـضياء فـي المُختـارة)، ئـەوەش ڕیوایـەتێكی دیكەیە عەبدوڵڵای كوڕی عەبباس خوا لێیان ڕازی بێ دەڵێ: پێغەمبـەری خـوا ﷺ بۆخۆی فەرمانی پێ دەكردین كە خێرو چاكە نـەكەینو مـاڵ نـەبەخـشین مەگەر بەوانەی كە ئەهلی ئیسلامن، هەتـا ئـەم ئایەتە هاتە خوار، دوای هاتنـه خواری ئەم ئایەتە، ئنجا پێغەمبەر ﷺ فەرمانی كرد، كـه هـەر كەسێك داوای لێكردین هاوكاریی ماددیی بكەین، خاوەنی هەر دینێك بێت.

٣) هـۆی هاتنـه خـوارەوەی ئـەو ڕسـتە قورئانییـەی، كـە دەفـەرموێ: ﴿ إِن تُبْدُوا۟ ٱلصَّدَقَٰتِ فَنِعِمَّا هِىَ ۖ وَإِن تُخْفُوهَا وَتُؤْتُوهَا ٱلْفُقَرَآءَ فَهُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ ﴾، ئەگەر خێرو چاكەكانتان ئاشكرا بكەن، ئەوە باشـترین شتە كە بە ئاشكرا ببیبەخشن، بـەڵام ئەگـەر بیـشی شـارنەوەو بیـدەن بـه هـەژاران، ئـەوە بـۆ ئێـوە چاكتـرە، لەوبارەوە ئەم بەسەرهاتە هەیە: {(قَـالَ الكَلـبِيُّ: لَمَـا نَـزَلَ قَولُـهُ تَعَالـى: ﴿ وَمَآ أَنفَقْتُم مِّن نَّفَقَةٍ أَوْ نَذَرْتُم مِّن نَّذْرٍ ... ﴾ قَـالوا: يـا رَسُولَ اللهِ! صَدَقَةُ الـسرِّ أفـضَلُ أم صَـدَقَةُ العَلانيـة ؟ فـأنزَلَ اللهُ تَعالـى هـذِهِ الآيـة) (أسـباب النـزول

للنیسابوری، ص (٦٢)}، واتە: کەلبیی (کە یەکێکە لە زانایان ڕەحمەتی خوای لێبێ) دەڵێ: کاتێ فسەی خوای بەرز هاتە خوار ﴿ وَمَآ أَنفَقْتُم مِّن نَّفَقَةٍ أَوْ نَذَرْتُم مِّن نَّذْرٍ ... ﴾، هەر ماڵێك ببەخشن‌و هەر نەزرێك بکەن خوا دەیزانێ، هاوەڵانی بەڕێز گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ! ماڵ بەخشینی پەنهان باشترە، یان ماڵ بەخشینی ئاشکرا ؟ خوای بەرز ئەم ئایەتەی ناردە خوارێ، کە دوایی لە مەسەلە گرنگەکان‌و حیکمەتەکاندا، دەیخەینەڕوو کە هەر کام لە: بە پەنهانیی بەخشین‌و بە ئاشکرا بەخشین، شوێنی تایبەتی خۆی هەیەو جاری وایە واچاکە پەنهان بێ‌و، جاری واش هەیە واباشە کە بە ئاشکرا بێ.

## مانـــای گشـــتی ئایەتەکـــان

خـــوا ﷻ لەســـەر ئاڕاســـتەکردن‌و ئامۆژگـــارییکردنی مـــسوڵمانان لـــە بـــواری ماڵبەخشین‌و چاکەکارییدا بەردەوامەو ڕوو لە بڕواداران دەکات‌و دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَنفِقُواْ مِن طَيِّبَٰتِ مَا كَسَبْتُمْ وَمِمَّآ أَخْرَجْنَا لَكُم مِّنَ ٱلْأَرْضِ ﴾، ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! لەو سامانە چاك‌و سوودبەخش‌و پەسندەی کە وەدەستتان هێناوە، وە لەوەی کە لە زەوی بۆمان دەرهێناون، ببەخشن ڕستەی ﴿ مِن طَيِّبَٰتِ مَا كَسَبْتُمْ ﴾، توێژەروانی قورئان گوتوویانە: واتە: ئەوەی لەڕێی بازرگانییەوە پەیدابووە، وە: ﴿ وَمِمَّآ أَخْرَجْنَا لَكُم مِّنَ ٱلْأَرْضِ ﴾، یانی: ئەوەی لەڕێی کشتوکاڵەوە پەیدادەبێ وەك: باغ‌و دانەوێڵەو...هتد، واتە: کامەی چاکە، چ ئەوەی لە ڕێی کڕین‌و فرۆشتن‌و بازرگانییەوە، چ لە ڕێی کشتوکاڵ‌و چاندن‌و ئەوانەوە وەدەستتان هێناوە، کامەی باشە، لەوە ببەخشن ﴿ وَلَا تَيَمَّمُواْ ٱلْخَبِيثَ ﴾، وە بۆ پیسەکەی‌و بۆ خراپەکەی مەخەفتێن، کامەی خراپەو بە کەڵك نایەت بۆ ئەوە بخەفتێن! ﴿ مِنْهُ تُنفِقُونَ وَلَسْتُم بِـَٔاخِذِيهِ ﴾، لێی دەبەخشن، بەڵام قەت لەو جۆرە وەرناگرن ﴿ إِلَّآ أَن تُغْمِضُواْ فِيهِ ﴾، مەگەر چاوی لێ بنووقێنن، واتە: مەگەر

بەشەرمدا بکەون، کەسێك شتێکت دەداتێ، دەزانی بەکەڵك نایەت، بەڵام لەبەر دڵی وی، یان بە هەر حاڵ بە هەر هۆیەك بێ، چاوی لێ دەنووقێنێو بە چاوپۆشییەوە وەریدەگری، ئەگەرنا ئەگەر ناچاریی نەبێ وەریناگری، واتە: ئەوەی کە بەخۆتان بە ناچاری نەبێ وەریناگرن، مەشیدەن بە خەڵکی ﴿وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ غَنِيٌّ حَمِيدٌ﴾، وە بشزانن خوا بێنیازەو ستایش کراوە، خوا دەوڵەمەندە بۆتان قەرەبوو دەکاتەوە، وە خوا ستایش کراوە، دەجا ئێوەش شتی وا بکەن لەسەری ستایش بکرێن، ئینسان لەسەر چ ستایش دەکرێ لەسەر ماڵ بەخشینی باش، شتێکی خراپ ببەخشێ لەسەری زەم دەکرێی، بۆیە هەر نەیکەی چاکترە.

ئنجا دەفەرموێ: ﴿ٱلشَّيۡطَٰنُ يَعِدُكُمُ ٱلۡفَقۡرَ وَيَأۡمُرُكُم بِٱلۡفَحۡشَآءِ﴾، شەیتان گفتی هەژارییتان پێدەدا، یاخود هەڕەشەی هەژارییتان لێ دەکات، دەڵێ: ئەگەر ببەخشن هەژار دەکەون ﴿وَيَأۡمُرُكُم بِٱلۡفَحۡشَآءِ﴾، وە فەرمانیشتان پێدەکات بە چرووکیی‌و ڕژدیی، کە لە خراپترین سیفەتەکانە ﴿وَٱللَّهُ يَعِدُكُم مَّغۡفِرَةً مِّنۡهُ وَفَضۡلًا﴾، بەڵام خوا گفتی لێبوردنێك لە خۆیەوە، وە بەخششێك لە خۆیەوەتان پێ دەدا، کە هەم لێتان ببووریێو هەم پێشتان ببەخشێ، هەم لە دنیاداو هەم لە دواڕۆژدا ﴿وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ﴾، وە خوا فراوانی زانایە، خوا سیفەتەکانی هەموو فراوانن، وە زاناشە، بەخششی زۆری هەیە، هەر ئەندازەیەك بیەوێ دەبەخشێ، وە زاناشەو دەزانێ بە کێ دەبەخشێو، چەندی دەداتێو چۆنی دەداتێ ؟ ﴿يُؤۡتِي ٱلۡحِكۡمَةَ مَن يَشَآءُ﴾، حیکمەت بە هەرکەسێك دەدا کە بیەوێ، خوا حیکمەت بە هەرکەسێك دەدا کە بۆخۆی بیەوێو بە شایستەی بزانێ، حیکمەت چییە ؟ ڕەوشت‌و بەهای بەرزو جوان، یاخود لە نیشانەدان لە قسەو لە کردەوەدا، قسەی بەجێو کرداری بەجێ، بەڵام وا پێدەچێ مەبەست پێی ڕەوشت‌و ئەدەب‌و بەهای بەرزو جوان بێ، وەك پێشتریش گوتوومانە: کە یەکێك لە ڕەوشت‌و بەها بەرزەکان، ئەوەیە کە ئینسان ماڵی باش ببەخشێو شتێك ببەخشێ کە بۆخۆشی حەزی لێ

دەکاتو، پێی خۆشە لەو جۆرە پێی ببەخشرێ ﴿ وَمَن يُؤْتَ ٱلْحِكْمَةَ فَقَدْ أُوتِىَ خَيْرًا ﴾، وە هەرکەسێك حیکمەتی پێ بدرێ، خێرو چاکەیەکی زۆری پێدراوە، کە بەڕاستی ماڵ بەخشینیش پێویستی بە حیکمەت هەیەو پێویستی بە لێزانییو بە کارامەیی هەیە ﴿ وَمَا يَذَّكَّرُ إِلَّآ أُوْلُواْ ٱلْأَلْبَٰبِ ﴾، وە پەند وەرناگرن بێجگە لە خاوەن عەقڵان، بێجگە لەوانەی کاکڵیان هەیە، کە کاکڵی ئینسان بریتییە لە عەقڵەکەی.

﴿ وَمَآ أَنفَقْتُم مِّن نَّفَقَةٍ أَوْ نَذَرْتُم مِّن نَّذْرٍ فَإِنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُهُۥ ﴾، وە هەر نەفەقەیەك ببەخشنو هەر نەزرێك لەخۆتان بگرن، خوا دەیزانێ ﴿ وَمَا لِلظَّٰلِمِينَ مِنْ أَنصَارٍ ﴾، وە ستەمکاران هیچ پشتیوانو دۆستو یارمەتی دەرێکیان نیە، واتە ئێوەش ستەم لەخۆتان مەکەن، بەجۆرێك ماڵ ببەخشن کە بەکەڵك نەیەت، یاخود نەزرێك بکەن کە لەجێی خۆیدا نەبێ، شتێك لەخۆتان بگرن بۆ مەبەستێکی خراپ، ئەگەر وا بکەن، ئەوە زوڵم لە خۆتان دەکەن، وە خوا بە هەموو شتێك ئاگادارەو ئێوە شتی وامەکەن کە سەرەنجام ستەمکار بێنەدەرێ، لە تەرازووی خوادا.

ئنجا دوای ڕوونکردنەوەی جۆری شتی بەخشراو دێتە سەر باسی چۆنیەتیو شێوازی بەخشینو دەفەرموێ: ﴿ إِن تُبْدُواْ ٱلصَّدَقَٰتِ فَنِعِمَّا هِىَ ۖ وَإِن تُخْفُوهَا وَتُؤْتُوهَا ٱلْفُقَرَآءَ فَهُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ ﴾، ئەگەر خێرو چاکەکانتان ئاشکرا بکەن، باشترین شتە بۆ ئێوە، بەڵام لەکاتی خۆیو لە شوێنی خۆیدا، وە ئەگەر پەنهانی بکەنو بیدەن بە هەژاران، ئەوەش چاکترە بۆ ئێوە، ئایا ئەمە چی لێوەردەگیرێ؟! جاری وا هەیە ماڵ بەخشین وا باشە بە ئاشکرا بێ، چ کاتێك؟ کاتێك کە تۆ لە خۆت ئەمینی لێت نابێتە ڕیا، وە لە بابای خێر پێکراو ئەمینی دڵی پێ ناشکێ، کەسێك دێ لە شوێنێك سواڵ دەکات، یان داوا دەکات لە مەجلیسێکداو شەرم ناکات ئەگەر چاکەت لەگەڵ کرد بەخۆدا بشکێتەوە، وە کاتەکەشی وایە کە ئەگەر تۆ هاوکاریی بکەی، ڕەنگە خەڵکی دیش چاو لە تۆ بکات، لەو حاڵەتەدا ئاشکراکردنی

باشتـره، بـەڵام لـە حاڵەتێکـدا کـە کەسـەکە ئەگـەر بێـتو لـەپێش چـاوی خـەڵکی هاوکـاریی بکـەی، دڵی پێ بشکێ، یاخود بۆخۆت لەخۆت دڵنیا نـەبیو ڕەنگـە لێـت ببێته ڕیـا، یاخود وا نەبێ کەس تەماشای تۆ بکات، ئـەوە هـیچ حیکمـەتی تێدانیـه ئاشـکرای بکـەیو، واباشـه بـه پـەنهانیی بێ، کـەواتە: خێـرو چاکـه وانیـه بڵـێی هەمیشه بە پـەنهانیی باشـه، یـان هەمیـشه بـه ئاشکرا باشـه، جـاری وا هەیـه بـه پەنهانیی باشـه، کە بەزۆریی وایـەو، جـاری واش هەیـه بـه ئاشـکرا باشـه، ئەگـەر خەڵکی دیکه تەماشـای تـۆ بکـاتو ببیـه سەرمەشـق بۆیـان ﴿ وَيُكَفِّرُ عَنكُم مِّن سَيِّـَٔاتِكُمْ ﴾، وە خوا لە خراپەکـانتان لێتان دەسـڕێتەوە، واتـە: لە ئەنجامی ماڵ بەخشینـدا ﴿ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ ﴾، وە خوا بەوەی کە دەیکەن شارەزایە، باش شارەزایە دەزانێ چۆن دەیکەن؟ بۆچی دەیکەن ؟ بە چ شێوەیەك ؟

ئنجـا لەبەرئـەوەی ئەوانـە کـە خێـرو چـاکەیان لەگەڵـدا دەکـرێو ماڵیـان پـێ دەبەخشرێ هەیە مسوڵمانە، هەیە مسوڵمان نیە، هەیە پارێزکـارە، هەیە گوناهبارە، هـەر لـەنێو مسوڵمانانیـشدا، بۆیـه خـوا دەفـەرموێ: ﴿ لَّيْسَ عَلَيْكَ هُدَىٰهُمْ ﴾، ڕێنماییکردنی ئەوانو خستنە سەر ڕێی هیدایەتی ئەوان، لەسەر تۆ نیە ﴿ وَلَـٰكِنَّ ٱللَّهَ يَهْدِى مَن يَشَآءُ ﴾، بەڵام خوا هەر کەسێکی بوێ هیدایـەتی دەدات، کەچـی تـۆ زۆریـشت پێخۆشـه کەسـێك هیدایـەت وەربگـرێو ناشـتوانی، کەواتـە: مـاڵ بەخشینەکەتان پەك مەخەن لەبەر ئەوەی ئەو کەسە هیدایەت نەدراوە، یان لەبـەر ئەوەی کـە بـە ئینـسانێکی باشـی نـازانی لـەڕووی دینداریيـەوەو تێبینیـت لەسـەری هەیـه ﴿ وَمَا تُنفِقُوا۟ مِنْ خَيْرٍ فَلِأَنفُسِكُمْ ﴾، وە هـەر ماڵێـك ببەخـشن، ئـەوە سـوودەکەی بۆخۆتانـه ﴿ وَمَا تُنفِقُونَ إِلَّا ٱبْتِغَآءَ وَجْهِ ٱللَّهِ ﴾، وە نابەخـشن مەگەر بەمەبەستی وەدەستهێنانی ڕەزامەندیی خـوا، واتـە: ئەگـەر مـسوڵمانی بـاش بن، هەر ئاوا دەبەخشنو تەنیا هانـدەرتان وەدەسـتهێنانی ڕەزامەنـدیی خـوا دەبـێ ﴿ وَمَا تُنفِقُوا۟ مِنْ خَيْرٍ يُوَفَّ إِلَيْكُمْ وَأَنتُمْ لَا تُظْلَمُونَ ﴾، وە هـەر ماڵێـك

ببەخشن بەتەواویی پاداشتتان دەدرێتەوە، وە هیچ ستەمتان لێناکرێ، یانی: دەربەست مەبن کە بڵێن: تۆ بڵێی ئەو بابایە پێی بشێ ؟ تۆ بڵێی موستەحەق بێ، موستەحەق نەبێ ؟ ئینسان دەبێ چاو وردبکاتەوە لە شوێنی شیاوی خۆیدا ماڵەکەی دابنێ، بەڵام جاری وا هەیە دەکەویە حاڵەتێکەوە، کەسێك داوای شتێکت لێدەکات کە بە لێقەوماو دێتە بەرچاو، پێویست ناکات زۆر تەحقیق بکەی: تۆ بڵێی وابێ وانەبێ ؟ هەڵبەتە ئینسان واباشە ماڵی خۆی بە لێزانانە ببەخشێ بەو کەسانەی کە شایستەن‌و پێیان دەشێ، بەڵام جاری واش هەیە واباشە زۆر ئەو وردەکارییە نەکەی‌و، پاداشتیش لەسەر خوایەو خوای پەروەردگار ستەم لە کەس ناکات.

ئنجا بۆمان ڕووندەکاتەوە کە بە کێ ببەخشین‌و زیاتر تیشکی دەخاتە سەر: ﴿ لِلْفُقَرَآءِ ٱلَّذِينَ أُحْصِرُواْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ﴾، ماڵ‌و سامانی خۆتان ببەخشن بەو هەژارانەی کە لەڕێی خودا ڕێیان لێگیراوە، واتە: بەهۆی جەنگ‌و جیهادکردنەوە، بەهۆی کاری ئیسلامییەوە، بوارو دەرفەتی کارو کەسابەتیان نیە، وەك خەڵکی دی، هەڵبەتە مەبەست لە: ﴿ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ﴾، تەنیا جەنگ‌و جیهاد نیە، بەڵکو هەر کەسێکە کە بە خزمەتی ئیسلام‌و مسوڵمانانەوە خەریکە، بۆ وێنە: مامۆستایەکە لە شارێك لە گەڕەکێك لە دێیەك مامۆستایەتی دەکات، یان قوتابییەکی زانستی شەرعییە، یان قوتابییەکی دیکەیەو ئومێدی خێری لێ دەکرێ، یان بانگخوازێکە، یان هەرکەسێکە کە لە ئەنجامی ئەوەدا کە بە کارێکەوە سەرقاڵە بە قازانجی خەڵك تەواو دەبێ، مەجالی کارو کەسابەتی نیە، ئا بەو جۆرە کەسانە ببەخشن، جا خوا سیفەتەکانیان باس دەکات‌و دەفەرموێ:

١- ﴿ لَا يَسْتَطِيعُونَ ضَرْبًا فِى ٱلْأَرْضِ ﴾، ناتوانن بەزەویدا بڕۆن، واتە: توانای جووڵان‌و کارو کەسابەتیان نیە.

٢- ﴿ يَحْسَبُهُمُ ٱلْجَاهِلُ أَغْنِيَآءَ مِنَ ٱلتَّعَفُّفِ ﴾، ئەوەی پێیان ئاشنا نەبێ، هێندە خۆ پاك ڕاگرن، هێندە نەفس بەرزن، بە دەوڵەمەندیان لێ حاڵی دەبێ! ئەوانە بدۆزنەوە، ئەوەی کە سواڵ دەکاو دیارو ئاشکرایە، ئەوە یەکی ناکەوێ، بەڵام هەیە پێی عەیبە داوا بکات‌و نەفس بەرزە عیززەتی نەفسی هەیەو

عیففەتی هەیە، تۆ دەبێ چاو بۆ ئەوانە بگێڕی.

٣- ﴿ تَعۡرِفُهُم بِسِيمَٰهُمۡ ﴾، ئەگەر مەبەستت بێ بە سیماو نیشانەکانیان دەتوانی پەیدایان بکەی‌و بیانناسی.

٤- ﴿ لَا يَسۡـَٔلُونَ ٱلنَّاسَ إِلۡحَافٗاۗ ﴾، داوا لە خەڵك ناکەن بە سووربوون‌و بە مکووڕیی، هەڵبەتە مەبەستی ئەوەیە کە هەر داوا ناکەن، بەڵام بۆیە لێرەدا دەفەرموێ: ﴿ لَا يَسۡـَٔلُونَ ٱلنَّاسَ إِلۡحَافٗاۗ ﴾، وە نەبێ بەبێ سووربوون (إلحاف) داوا بکەن، بەڵام مەبەست ئەوەیە کە وەك هەندێ کەس نین، کە زۆر داوابکەن‌و یەخەی خەڵك بگرن، بەڵکو لەماڵی خۆیان دانیشتوون، ئەگەر لە برسان بمرن، عیززەتی نەفسیان ڕێیان لێ دەگرێ کە سواڵ بکەن‌و داوا بکەن ﴿ وَمَا تُنفِقُواْ مِنۡ خَيۡرٖ فَإِنَّ ٱللَّهَ بِهِۦ عَلِيمٌ ﴾، وە هەر ماڵێك ببەخشن، بێگومان خوا پێی زانایە

لە کۆتاییدا دەفەرموێ: ﴿ ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمۡوَٰلَهُم بِٱلَّيۡلِ وَٱلنَّهَارِ سِرّٗا وَعَلَانِيَةٗ ﴾، ئەوانەی ماڵ‌و سامانەکانی خۆیان دەبەخشن، بە شەو بە ڕۆژ، بە پەنهانیی‌و بە ئاشکرا ﴿ فَلَهُمۡ أَجۡرُهُمۡ عِندَ رَبِّهِمۡ وَلَا خَوۡفٌ عَلَيۡهِمۡ وَلَا هُمۡ يَحۡزَنُونَ ﴾، ئا ئەوانە پاداشتیان لای پەروەردگاری خۆیانیان هەیە، وە نە ترسیان هەیە بۆ داهاتوو، وە نە خەمباریش دەبن بۆ ڕابردوو، لێرەدا خوا ﷻ چوار حاڵەتی بۆ ماڵ بەخشین دیاریی کردوون: بە شەو، بە ڕۆژ، بە پەنهانیی، بە ئاشکرا، چونکە جاری وایە پێویست دەکات بە شەو ببەخشی‌و جاری وا پێویست دەکات بە ڕۆژ، وە جاری وایە پێویست دەکات بە ئاشکراو جاری وایە پێویست دەکات بە پەنهانیی، بەپێی حاڵەتی کەسەکان کە یارمەتییان دەدەی‌و، بەپێی حاڵەتی ئەو کەسانەی کە پێویستییان هەیە، وەك باسمان کرد حیکمەت ئەوەیە کە هەرکەسە، وە هەر حاڵەتە بەپێی خۆی مامەڵەی لەگەڵدا بکرێ، وەك گوتراوە (لِكُلِّ مَقَامٍ مَقَالْ)، واتە: بۆ هەر حاڵەتە قسەیەك هەیە.

## چەنـد مەسـەلەیەکـی گرنـگ

**مەسەلەی یەکەم:** خوا ﷻ کە دەفەرموێ: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَنفِقُواْ مِن طَيِّبَـٰتِ مَا كَسَبْتُمْ وَمِمَّآ أَخْرَجْنَا لَكُم مِّنَ ٱلْأَرْضِ ﴾، واتە: ئەی بڕوادارینە ! ببەخشن لەوماڵو سامانە چاکەی کە وەدەستتان هێناوە، وە لەوەی کە لە زەوی بۆمان دەرهێناون، توێژەرەوانی قورئان لەوبارەوە کە ئایا مەبەستپێی ماڵ خەرجکردنی فەرزە، یان هی سوننەت ؟ قسەو باسی زۆریان کردوە، بەڵام واپێدەچێت ڕای ڕاستتر ئەوەبێ کە مەبەست پێی هەردووکیانە، واتە: خوا ﷻ لێرەدا فەرمان دەکات بە مسوڵمانان، کە لەو ماڵو سامانەی لەبەردەستیان دایە، چ ئەوەی لەڕێی کەسابەتو بازرگانییەوە وەدەستیان هێناوە، وە چ ئەوەی لە ئەنجامی کارکردن لە زەویدا، جا چ بە شێوەی کشتوکاڵ، وە چ بە شێوە دەرهێنانی کانزایەکان، یاخود دۆزینەوەی خەزنەی ژێرزەوی، لە هەموو ئەو شتانە لە پێناوی خوادا ببەخشن، ئیدی ئەوە هەم فەرزیش دەگرێتەوەو هەم سوننەتیش، فەرز وەك زەکات، وە جاری وا هەیە غەیری زەکاتیش فەرزە، وە سوننەتیش ئەوەیە کە ئینسان خۆبەخشانە دەیبەخشێ، بەبێ ئەوەی کە شەریعەت لەسەری پێویست کردبێ.

**مەسەلەی دووەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ مِن طَيِّبَـٰتِ مَا كَسَبْتُمْ وَمِمَّآ أَخْرَجْنَا لَكُم مِّنَ ٱلْأَرْضِ ﴾، لەو ماڵو سامانە چاكو باشانەی کە وەدەستتان هێناوە، وە لەوەی کە لە زەوی بۆمان دەرهێناون، (طَيِّبات) کۆی (طَيِّبَة)یە (طَيِّبَة)ش لە: (طَابَ يَطِيبُ طَيِّباً فَهُوَ طَيِّبٌ) لەوەوە هاتوە، واتە: هەر ماڵێك کە چاكو نایابە ئەوەی کە ئینسان بە قیمەتو بەباشی دەزانێ، کە وەك گوتمان: لێرەدا مەبەست ئەوەیە ئینسان کە شتێك دەبەخشێ، دەبێ شتی باشبێو بۆخۆی پێی چاك بێ، ئەگەر خۆی پێی بدرێ، پێی خۆشبێ، لەو جۆرەی پێبدرێ لەوە ببەخشێ هەندێك لە توێژەرەوانی قورئان گوتوویانە: لێرەدا مەبەست لە (طَيِّبَات) ماڵی حەڵاڵە، بەڵام من وای بۆ دەچم کە ناگونجێ وشەی (طَيِّبَات) نە لێرەو نە لە هیچ شوێنێکی

دیکەی قورئاندا مەبەست پێی حەڵاڵ بێ، بۆچی؟ چونکە خوا ﷻ لە سوورەتی (الأعراف)دا، وە لەجێی دیکەشدا باسی ئەوەی کردوە کە (طَيِّبَات)ی حەڵاڵ کردوە، بۆوێنە: ﴿...وَيُحِلُّ لَهُمُ ٱلطَّيِّبَٰتِ ...﴿١٥٧﴾﴾ الأعراف، جا ئەگەر بەمانای حەڵاڵ بێت دەبێ بڵێ (يُحِلُّ لَهُمُ الحَلال) ڕزقی حەڵاڵیان بۆ حەڵاڵ دەکات! کە دیارە ڕزقی حەڵاڵ هەر بۆ خۆی حەڵاڵەو پێویستی بە حەڵاڵ کردن ناکات، کەواتە: مەبەست لە (طَيِّبَات) وەك گوتمان هەر شتێکە کە ئینسان پێی باشبێو لەززەتی لێبکات، لە خواردنو خواردنەوەو بەرگو پۆشاكو دەنگو ئاوازو دیمەنو ڕەنگ و... هتد، واتە: وشەی (طَيِّبَات) هەر شتێکی سوودبەخشو باشو پەسندە، بەپێی فیطرەتو سروشتی ساغی مرۆڤ.

**مەسەلەی سێیەم:** کە دەفەرموێ: ﴿مِن طَيِّبَٰتِ مَا كَسَبۡتُمۡ﴾ لەو ماڵو سامانە باشو چاکەی کە وەدەستتان هێناوە، کە وەدەست دەهێنرێ لەرێی بازرگانییەوە، لەرێی کڕینو فرۆشتنەوە، بە هۆی میراتەوە، لە ڕێی بەکرێدان (إيجار)ەوە، هەروەها ماڵو سامانی منداڵیش بۆ بابو دایکی ئەویش هەر دەچێتە ژێر حوکمی ئەوەی کە ئینسان وەدەستی دێنێ، چونکە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {(إِنَّ أَولَادكُم مِن طَيِّبِ أَكسابِكُم فَكُلَوا مِنْ أَموالِ أولادكُم هَنِيئاً) (رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ برقم: (٣٥٢٨)، وَالنَّسَائِيُّ برقم: (٤٤٦٢)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (١٣٥٨)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٢٢٩٠)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٤٢٥٩)، عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا، وَصَحَّحَهُ الألباني في (السلسلة الصحيحة) برقم: (٢٤١٤)}، واتە: منداڵەکانتان لە وەدەست هێنراوی پاكو چاکی ئێوەن، بۆیە لە ماڵو سامانی منداڵەکانتان بە موڕتاحیی بخۆنو {دیارە ئەوە لە حاڵێکدا کە بابو دایك ئاتاج بنو پێویستییان بە ماڵ سامانی منداڵو ڕۆڵەیان هەبێ، بۆیان هەیە لێی بەکاربێنن}.

**مەسەلەی چوارەم:** کە دەفەرموێ: ﴿وَمِمَّآ أَخۡرَجۡنَا لَكُم مِّنَ ٱلۡأَرۡضِ﴾، وە لەوەی کە لە زەوی بۆمان دەرهێناون، وەك گوتم چ لە ڕێی کشتوکاڵەوە بێ، چ لە ڕێگای کانزاو مەعدەنەکانەوە بێ، یان دۆزینەوەی خەزنەی ژێر زەوی بێ، یان

هەر شێوە لێ بەهرەمەندبوونێکی دیکەی زەوی بێت، کە ببێتە مایەی هاتنە دەستی موڵك‌و سامان‌و ئیمکانیەتی ماددیی.

**مەسەلەی پێنجەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تَيَمَّمُواْ ٱلْخَبِيثَ ﴾، ﴿ وَلَا تَيَمَّمُواْ ﴾، واتە (ولا تَقصُدُوا) واتە: مەخەفتێن لە شتی خراپ کە خێرو چاکە دەکەن، جا چ پێویست بێ وەکو زەکات، یان سوننەت بێ، بۆ وێنە: کەسێك خۆبەخشانە خێرێك دەکات، نابێ بۆ کام ماڵەی خراپەو بەکەڵك نەهاتوویە، بۆ ئەوە بخەفتێ، وەك لە هۆی هاتنە خوارەوەکەشدا باسمان کرد، بەڵام کە دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تَيَمَّمُواْ ٱلْخَبِيثَ ﴾، واتە: بۆ هی خراپ مەگەرێن، توێژەرەوانی قورئان دەڵێن: ئەگەر کەسێك مەبەستی نەبووبێ‌و، بە ئانقەست لە هی خراپ نەخەفتابێ، گوناهبار نیە، بۆوێنە: یەکێك خێرێك دەکات مەبەستی ئەوە نەبووە کە بۆ شتی خراپ بگەرێ، بەڵکو ماڵ‌و سامانێکی هەیە هەندێکی لێ جیادەکاتەوە، بێ ئەوەی بۆ خراپەکەی خەفتابێ، ئەگەر لە خودی خۆیدا باشیش نەبێ، گوناهبار نابێ، مادام مەبەستی نەبووبێ، واتە: کاتێك مرۆڤ گوناهبار دەبێ کە کەمتەرخەمیی کردبێ لە ماڵ بەخشینداو، بە مەبەست بگەرێ بۆ ئەوەی بەکەڵك نایەت‌و بە دڵی نیەو بە ناپەسندی دەزانێ، بەڵام ئەگەر ماڵەکەی چەند جۆرێکی تێکەڵ بێ‌و وا هاتبێتە بەردەست بەبێ مەبەست، لەو حاڵەتەدا گوناهبار نابێ.

**مەسەلەی شەشەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ مِنْهُ تُنفِقُونَ وَلَسْتُم بِـَٔاخِذِيهِ إِلَّآ أَن تُغْمِضُواْ فِيهِ ﴾، واتە لە شتێك مەبەخشن، کە خۆتان ئامادەنین وەریبگرن، مەگەر بەچاو لێنووقاندن‌و بە خاتر گرتنەوەبێ.

توێژەرەوانی قورئان دەڵێن: لێرەدا تەرازوو ئەوەیە کە بیکاتە پێوەرو تەرازوو، هەرچی بۆخۆی پێی خۆش نیە لەو جۆرە پێی بدرێ، با لەو جۆرە بە خەڵکیش نەدات، چونکە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {(لاَ يُؤْمِنُ أَحَدُكُمْ حَتَّى يُحِبَّ لأَخِيهِ ما يُحِبُّ لِنَفسِهِ) (رَوَاهُ البُخَارِيُّ برقم: (١٣) عَنْ حسين المعلم رضي الله عنه}، واتە: یەکێك لە ئێوە بە بڕوادار دانانرێ، تاکو چی بۆخۆی پێ

خۆشە بۆ برای مسوڵمانیشی پێی خۆش نەبێ، هەروەها بە پێچەوانەوەش چی بۆخۆی پێ ناخۆشە دەبێ بۆ ئەویش پێی ناخۆشبێ، پێت ناخۆشە شتێکی خراپت بدەنێ، بە هەمان شێوە شتی خراپیش مەدە بە خەڵك.

ئنجا دیارە دوێنراوەکان (مخاطبین)ی ئەو کاتەی کۆڕەکەی پێغەمبەر پیاو بوونە، بۆیە فەرموویەتی: (لأخیه)، ئەگەرنا پیاوو ئافرەت هەردووکیان مەبەستن.

**مەسەلەی حەوتەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ ٱلشَّيۡطَٰنُ يَعِدُكُمُ ٱلۡفَقۡرَ وَيَأۡمُرُكُم بِٱلۡفَحۡشَآءِۖ وَٱللَّهُ يَعِدُكُم مَّغۡفِرَةً مِّنۡهُ وَفَضۡلًاۗ ﴾، واتە: شەیتان بەڵێنی هەژارییتان پێ دەدا، وە فەرمانتان پێ دەکات بە چرووکییو ڕژدیی، بەڵام خوا بەڵێنی لێبوردنتان پێ دەداو، وە بەڵێنی بەخششو چاکەی خۆیتان پێ دەدا، لێرەدا یەکێك بۆی هەیە بڵێ: کوا شەیتان نەمانبینیوە کەس لە هەژاریی بترسێنێ، وە نەمانبینیوە بە کەسێ بڵێ: چرووك ڕژدو دەست نووقاوبە ؟! وەڵامەکەی ئەوەیە کە شەیتان لەڕێی خوتخوتەو وەسوەسەوە ئەو هەڕەشەیە لە خەڵك دەکاتو، ئەو بەڵێنە خراپەیان پێدەدات، وە ئەو فەرمانە خراپەیان پێدەکات، کەواتە: بەڵێ کەس شەیتانی نەبینیوە بە شێوەیەکی بەرجەستە، بەڵام مەبەست ئەوەیە ئەو خوتخوتەو خەیاڵە خراپەی دەکەوێتە دڵی کەسانی دەوڵەمەندو ساماندارەوە، کە نەبەخشنو ئەگەر ببەخشن هەژار دەبن، بۆیە پێویستە ڕژدییو چرووکیی بکەن، ئا ئەوە لە شەیتانەوەیە، هەروەك پێچەوانەکەیشی کە کەسێك نیەتی باشی دێتە دڵ، کە ببەخشێو چاکە بکات، دیارە ئەوەش لە فریشتەکانەوەو لە خوای پەروەردگارەوەیە، چونکە خوا دەفەرموێ: ﴿ وَٱللَّهُ يَعِدُكُم مَّغۡفِرَةً مِّنۡهُ وَفَضۡلًاۗ ﴾، وە خوا بەڵێنی لێبوردنتان پێدەدا، وە بەڵێنی بەخششو چاکەی خۆیتان پێدەدات، کەواتە: ئەوەی کە بەرچاو تێرەو دڵ دەوڵەمەندەو دەستکراوەیە، ئەوە واپێدەچێ ئەو حاڵەتە فیکرییو ڕووحییە بەتایبەتی ئەگەر لە ئەهلی ئیمان بێ، لە فریشتەکانەوە بێ، بەڵکو دەگونجێ ئەگەر بێبڕواش بێ هەروابێ، چونکە فریشتەکان لە دنیادا سەرچاوەی هەموو خێروچاکەیەکنو، هەر

سیفەتێکی چاکبێ دەگەڕێتەوە بۆ هاندانی فریشتەکان، وە شەیتانەکان سەرچاوەی خراپەن‌و هەر سیفەتێکی خراپ بێ، دەگەڕێتەوە بۆ هاندانی شەیتانەکان، پێغەمبەریش ﷺ لە فەرمودەیەکدا ئەوەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە کە فەرموویەتی: {(إِنَّ لِلشَّيْطَانِ لَمَّةً بِابْنِ آدَمَ وَلِلمَلَكِ لَمَّةً، فَأَمَّا لَمَّةُ الشَّيْطَانِ فَإِيعادٌ بِالشَّرِّ وتَكْذِيبٌ بِالحَقِّ، وَأَمَّا لَمَّةُ المَلَكِ فَإِيعادٌ بِالخَيْرِ وتَصْدِيقٌ بِالحَقِّ، فَمَنْ وَجَدَ ذَلِكَ فَلْيَعْلَمْ أَنَّهُ مِنَ اللهِ فَلْيَحْمَدِ اللهَ وَمَن وَجَدَ الأُخرَى فَلْيَتَعَوَّذْ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجيم، ثُمَّ قَرأَ: ﴿ ٱلشَّيْطَٰنُ يَعِدُكُمُ ٱلْفَقْرَ وَيَأْمُرُكُم بِٱلْفَحْشَآءِ ۖ وَٱللَّهُ يَعِدُكُم مَّغْفِرَةً مِّنْهُ وَفَضْلًا ﴾) (رَوَاهُ التِّرمِذِيُّ بِرقم: (٢٩٨٨)، ضَعَّفَهُ الألباني في (ضعيف الجامع) برقم: (١٩٦٣)، وفي (المشكاة) برقم: (٧٤)، ثُمَّ صَحَّحَهُ في هداية الرواة (٧٠)، (النصيحة: ٣٤)، صحيح موارد الظمآن (٣٨)}، واتە: ئینسان هاندەرێکی شەیتانیی هەیە لە دەروونیدا، وە هاندەرێکی فریشتەییشی هەیە {هەم شەیتان هانی دەداو هەم فریشتەش هانی دەدا} هاندانی شەیتان بریتیە لەوەی کە هەڕەشەی لێدەکا بە خراپە کە بڕوا بە هەق نەهێنێ‌و بە درۆی بزانێ {بۆ وێنە: مەبەخشە ئەگەرنا هەژار دەبی، جیهاد مەکە ئەگەرنا تووشی بەڵا دەبی، کۆچ مەکە ئەگەرنا ماڵوێران دەبی، چاکە مەکە دوایی پەشێمان دەبیەوە ... هتد}، بەڵام هاندانی فریشتە بریتیە لەوەی کە بەڵێنی پێ دەدا بە چاکە، وە هانیشی دەدا کە بڕوا بە هەق بێنێ، جا هەرکەسێك ئەوەی بینی لەدڵیداو هەستی پێکرد، ئەوە بابزانێ لە خواوەیەو لەڕێی فریشتەکانەوەیە، (خوای پەروەردگار ئیلهامی خەیری خۆی دەنێرێ لەڕێی فریشتەکانەوە} وە با ستایشی خوای لەسەر بکات، وە هەرکەسێك هەستی بە هاندەری دووەم کرد {کە بریتیە لەوەی شەیتان هانی بدات بۆ چرووکیی‌و بۆ بڕوانەهێنان بە هەق} ئەوە با پەنا بە خوا بگرێ لە شەیتان، {واتە: بڵێ: (أَعُوذُ بِٱللَّهِ مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ) دوایی پێغەمبەر ﷺ ئەو ئایەتەی خوێندەوە: ﴿ ٱلشَّيْطَٰنُ يَعِدُكُمُ ٱلْفَقْرَ... ﴾} {شەیتان هەڕەشەی هەژاریتان لێدەکات}.

**مەسەلەی هەشتەم:** کە خوا دەفەرموێ: ﴿ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ ﴾، وەك پێشتریش باسمان کردوە، خوا ﷻ دوای هەر کام لەو ئەمرو نەهیانەی کە ئاڕاستەی مسوڵمانانیان دەکات، ئایەتەکە بە هەندێك لە سیفەتەکانی خۆی تەواو دەکات، کە بگونجێ لەگەڵ نێوەرۆکی ئەو فەرمانە یاخود ئەو نەهیەدا، لێرەدا کە دەفەرموێ: ﴿ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ ﴾، وە خوا فراوانی زانایە، واتە: سیفەتەکانی خوا فراوانن بەبێ سنوور، ڕەحمەتو بەخشینی خوا فراوانەو دەتوانێ بەبێ سنوور ببەخشێ، وە زاناشە دەزانێ بە کێ ببەخشێ.

**مەسەلەی نۆیەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ يُؤْتِي ٱلْحِكْمَةَ مَن يَشَآءُ ۚ وَمَن يُؤْتَ ٱلْحِكْمَةَ فَقَدْ أُوتِيَ خَيْرًا كَثِيرًا ﴾، حیکمەت بە هەرکەسێك دەدات کە بیەوێ، وە هەرکەسێك حیکمەتی پێ بدرێ خێرو چاکییەکی زۆری پێ دراوە، لێرەدا باسکردنی حیکمەت لەمیانەی باسی بەخشیندا ئەوە دەگەیەنێ کە بابای بەخشەرو خێرومەند کە ماڵی خۆی خەرج دەکات لە پێناوی خوادا، دەبێ لێزان و کارزان بێ‌و، زۆر بە سەلیقە بێ‌و، بزانێ چۆن ماڵەکەی دەبەخشێ‌و ؟ بە کێی دەبەخشێ‌و ؟ بە چ شێوەیەك خەرجی دەکات ؟ چونکە مەسەلە هەر خەرجکردن نیە، بەڵکو بە کێی دەدەی ؟ چەند دەبەخشی ؟ لە چ وەختێکداو بە چ شێوەیەك ؟ هەموو ئەمانەش بەڕاستی زۆر گرنگن، پێشتریش باسی وشەی حیکمەتمان کردو گوتمان: ئەوانەی کە گوتوویانە: مەبەست لە حیکمەت سوننەتی پێغەمبەرە ﷺ، نەیانپێکاوەو حیکمەت واتە: دانایی‌و وەستایی، یان خۆ ڕازاندنەوە بە بەها بەرزەکان، یاخود ئەوەی کە ئینسان قسەو کردەوەی بەجێ بێ (الإصابةُ في القَوْلِ والعَمَل)، وە ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەریش ﷺ بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە وشەی (حِكمة) واتە: لێزانیی‌و وەستایی: {(لاَ حَسَدَ إلاَّ في اثْنَتَيْنِ: رَجُلٌ آتَاهُ اللهُ مَالاً، فَسَلَّطَهُ عَلَى هَلَكَتِهِ في الحَقِّ، وَرَجُلٌ آتَاهُ اللهُ الحِكْمَةَ، فَهُوَ يَقْضِي بِهَا وَيُعَلِّمُهَا) (رَوَاهُ البُخَارِيُّ برقم: (٧٣)، وَمسلم برقم: (١٨٩٣)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٤٢٠٨)، عَن عَبدِاللهِ بنَ مَسْعُودٍ رضي الله عنه}، واتە:

حەسوودیی تەنها لە دوو حاڵەتاندا، یان بۆ دوو خەسڵەتان دروستە {کە لێرەدا مەبەست لە حەسوودیی ئەوە نیە، کە تۆ خۆزگە بخوازی ئەو چاکەو نیعمەتە لەو کەسە لابچێت، بەڵکو لێرەدا یانی: ئەوە کە تۆش حەز بکەی وەك ئەوت هەبێت، کە بە عەرەبی (غِبطَة)ی پێ دەڵێن، بەڵام حەسەد ئەوەیە کە تۆ حەز بکەی ئەو نیعمەتە لەو کەسە لابچێ‌و بۆ تۆ بێ، یاخود هەر لەو لابچێ، ئەگەر بۆ تۆش نەیەت، کەواتە: مەبەست لەو فەرموودەیە بە کورتی، یانی: خۆزگە بە نیعمەتی خەڵك خواستن لە دوو شتاندا زۆر جێی خۆیەتی}:

**یەکێکیان**: پیاوێك کە خوا ماڵ‌و سامانێکی زۆری داوەتێ، وە یارمەتیشی داوە کە لە هەقدا خەرجی بکات.

**دووەم**: پیاوێك کە خوا ﷻ حیکمەتی پێداوەو بەو حیکمەتەش ڕەفتار دەکات‌و وە فێری خەڵکیشی دەکات، کەواتە حیکمەت لێرەدا ناگونجێ مەبەست پێی سوننەتی پێغەمبەر ﷺ بێ، بەڵکو حیکمەت واتە زانیاری بەسوودو کردەوەی بەسوود، یاخود ئەدەب‌و ڕەوشت‌و هەڵسوکەوتی بەرزو جوان، کە ئەوە دەگونجێ بە غەیری پێغەمبەرانیش (علیهم الصلاة والسلام) بلرێ، وەك خوا فەرموویەتی: ﴿وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا لُقْمَٰنَ ٱلْحِكْمَةَ ... ﴿١٢﴾﴾ لقمان، واتە: بێگومان حیکمەتمان بە لوقمان دابوو، لوقمانیش لای زۆربەی هەرە زۆری زانایان پیاوێکی حەکیم‌و لێزان بووە، بەڵام پێغەمبەر نەبووەو وەحی بۆ نەهاتوە، جا زانایان بە چەند شێوەیەك پێناسەی (حِكْمَة)تیان کردوە، وەك پێشتریش باسمان کرد، یەکێکیان دەڵێ: (الحِكْمَةُ: الإصابَةُ في القَولِ والعَمَلْ) واتە: حیکمەت ئەوەیە ئینسان قسەی بەجێ‌و کرداری بەجێبێ، هەندێکی دیکە گوتوویانە: (الحِكْمَةُ: مَعرِفَةُ الحَقِ والعَمَلِ بِهِ) حیکمەت بریتیە لەوەی هەق بناسی وە کاری پێ بکەی، هەندێکی دیکە گوتوویانە: (الحِكْمَةُ: مَعرِفَةُ المَوجوداتِ وفعل الخَيرات) حیکمەت ئەوەیە کە بوونەوەرەکان بناسی، وە کردەوە چاکەکان ئەنجام بدەی، هەندێکی دیکە گوتوویانە: (الحِكْمَةُ: إدراكُ أسرار الشَرِيعة) حیکمەت بریتیە لە پەیبردن بە نهێنیەکانی شەریعەت.

بەڵام وەك لە ڕابردووشدا گوتمان من پێم وایە ئەگەر بڵێین: حیکمەت بریتیە لە خۆ ڕازاندنەوە بە خەسڵەتو ئاكارە بەرزو پەسندەكان، وە دووریی لە خووخدە نزمو پەستەكان، ئەوە پێناسەیەكی گشتگیرترە، چونكە هەم قسەی چاكو هەم كردەوەی چاكو هەم ڕەوشتی بەرزو جوانو هەم هەڵسوكەوتی بەجێ، هەمووی دەگرێتەوە، پێشتر بەڵگەی هەڵبژاردنی ئەم پێناسەیەمان باسكردو لێرە دووبارەی ناكەینەوە.

**مەسەلەی دەیەم:** كە دەفەرمویٚ: ﴿ وَمَا يَذَّكَّرُ إِلَّآ أُوْلُواْ ٱلْأَلْبَٰبِ ﴾ ﴿ وَمَا يَذَّكَّرُ ﴾ ئەسڵەكەی (وَمَا يَتَذَكَّرُ) واتە: بیرناكاتەوە، یاخود پەند وەرناگریٚ جگە لە خاوەن عەقڵان، (أَلْبَاب) كۆی (لُبّ)ە، (لُبّ) واتە: كاكڵ، بەڵام بۆچی خوا ﷻ عەقڵی بە (لُبّ) ناوبردوە ؟ چونكە وەك پێشتریش گوتمان، وەك چۆن هەر شتێك ئامانج لێی كاكڵەكەیەتی، حەقیقەتو كاكڵی ئینسانیش عەقڵەكەیەتیو، ئینسان عەقڵەكەی لیٚ دەربێنە، دەمێنێتەوە قاوغو توێكڵێكی بۆش، وە ئەم تەعبیرە ئەوەش دەگەیەنیٚ كە بەڕاستی خوای پەروەردگار زۆر حیساب بۆ عەقڵو بیرو هۆشو تێگەیشتنی ئینسان دەكات، چونكە لێرە دەفەرمویٚ: تەنیا خاوەن عەقڵان پەند وەردەگرن، وە لە چەندان شوێنی دیكەی قورئاندا خوا ﷻ دەفەرمویٚ: ئایەتەكانم ناردوە بۆ خاوەن عەقڵان، خاوەن عەقڵەكان لە نیشانەكانی خوا، لە ئاسمانو زەوی تێدەگەنو، نهێنییەكانی خوای بیٚ هاوتا دەرك پێدەكەن، كەواتە: ئیسلام گرنگییەكی زۆر بە عەقڵ دەدات، هەڵبەتە عەقڵێكی سەلیمو بەجیٚ، عەقڵێك كە دووربیٚ لەوەی كە بكەوێتە ژێر كاریگەریی ئارەزووەكانو شوبهەكانەوە.

**مەسەلەی یازدەیەم:** خوا ﷻ دەفەرمویٚ: ﴿ وَمَآ أَنفَقْتُم مِّن نَّفَقَةٍ أَوْ نَذَرْتُم مِّن نَّذْرٍ فَإِنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُهُۥ ﴾، هەر ماڵێك خەرج بكەن، یاخود هەر نەزرێك بكەن خوا دەیزانیٚ وشەی: (نَفَقَة)، ئەوە دیارە هەمووی دەگرێتەوە، چ ماڵی نەختینە، چ بەرگو پۆشاك، چ ئاژەڵ، چ دانەوێڵە، ... هتد، (نَذْر)یش شتێكە

کە ئینسان لەسەر خۆی پێویستی دەکات، بەڵام خوا لەسەری پێویست نەکردوە، زانایان ئاوا پێناسەی (نَذْر)یان کردوە: (النَّذْرُ: هُوَ مَا أَوْجَبَهُ الْمُكَلَّفُ عَلَى نَفْسِهِ مِنَ العِبَادَاتِ مِمَّا لَو لَمْ يُوجِبْهُ لَمْ يَلْزَمْهُ) واتە: نەزر بریتیە لەوەی کە بەندە لەسەر خۆی پێویستی دەکات لە خواپەرستییەکان، کە ئەگەر خۆی لەسەر خۆی پێویستی نەکردبایە، لەسەری فەرز نەبوو ئەنجامی بدا.

جا ئایا نەزر باشە ئینسان بیکات، یان باش نیە؟ زانایان مشتومڕیان لەوەدا هەیە، بەڵام وا پێناچێ خراپ بێ، جا ئەوانەی کە بە باشی دەزانن گوتوویانە: نەزر شتێکی باشە، چونکە خوا ﷻ مەدحی ئەوانەی کردوە، کە وەفا بە نەزر دەکەن، وەك لە سوورەتی (الإنسان)دا دەفەرموێ: ﴿ يُوفُونَ بِالنَّذْرِ ... ﴿٧﴾ ﴾، واتە: وەفا بە نەزر دەکەن، شتێکیان کە لە خۆیان گرت وەفای پێدەکەنو جێبەجێی دەکەن، وە لێرەشدا دەفەرموێ: ﴿ وَمَآ أَنفَقْتُم مِّن نَّفَقَةٍ أَوْ نَذَرْتُم مِّن نَّذْرٍ ﴾، جا ئەگەر نەزرو شت لەخۆگرتن شتێکی خراپ بووایە، خوای پەروەردگار ئاماژەیەکی پێدەدا، کە واباشە نەکرێ، نەك ستایشی ئەنجامدەرانی بکات.

**مەسەلەی دوازدەیەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ وَمَا لِلظَّٰلِمِينَ مِنْ أَنصَارٍ ﴾، وە ستەمکاران هیچ پشتیوانێکیان نیە، دەگونجێ مەبەست پێی کەسانی ڕیابازو منەتکاربێ، کە ماڵ دەبەخشن بە ڕیابازیی، یاخود منەت دەکەن لەسەر ئەو کەسەی کە هاوکارییان کردوە، یان دوای ئەوەی ماڵەکەیان پێ بەخشیوە، ئازاری دەدەن، پاش ملە باسی دەکەنو پێی دەگاتەوەو پێی ناخۆشە، وە دەشگونجێ مەبەست ئەو کەسانەبێ کە ڕژدو چرووکن ماڵو سامانەکانیان لە دەست نایەتەدەرو، لەپێناوی خوادا لە شوێنێکدا کە شەرع دیاری کردوە، نایبەخشن، وە دەشگونجێ مەبەست پێی هەردووکیان بێ، چونکە هەردووکیان ستەمکارن هەم ئەوەی کە ماڵی خۆی دەبەخشێ بە شێوەیەکی ناشەرعییانەو، هەم ئەوەش کە نایبەخشێو چرووکیی‌و ڕژدیی دەکات، ئەویش بەتەئکید ستەمکارە، هەڵبەتە هیچ ڕێگر (مانع)ێکیش نیە کە هەردووکیان پێکەوە مەبەست بن، لێرەشدا

دەڵێم: هەزاران ڕەحمەت لە پێشەوای توێژەرەوانی قورئان (أبو جعفر الطبري) کە هەمیشە هەوڵدەدات چەمك و واتای ئایەتەکان فراوان و گشتگیر بخاتەڕوو .

**مەسەلەی سێزدەیەم:** دەربارەی ئەوە کە ئایا وا باشە ئینسان ماڵ کە دەبەخشێ، بە ئاشکرا بیبەخشێ، یان بە پەنهانیی ؟ زانایان لەوبارەوە زۆریان قسە کردوە، ئایەتەکەش دەفەرموێ: ﴿ إِن تُبۡدُواْ ٱلصَّدَقَٰتِ فَنِعِمَّا هِيَۖ وَإِن تُخۡفُوهَا وَتُؤۡتُوهَا ٱلۡفُقَرَآءَ فَهُوَ خَيۡرٞ لَّكُمۡ ﴾، ئەگەر ئەو ماڵ و سامانەتان کە دەیبەخشن ئاشکرای بکەن، باشترین شتە، وە ئەگەر پەنهانیی بکەن و بیدەن بە هەژاران، ئەوە بۆ ئێوە چاکترە، جا زانایان لەوبارەوە دوو ڕای سەرەکییان هەن:

١- هەندێکیان دەڵێن: وا باشە ماڵ و سامان بە پەنهانیی ببەخشرێ، چونکە خوا دەفەرموێ: ﴿ وَإِن تُخۡفُوهَا وَتُؤۡتُوهَا ٱلۡفُقَرَآءَ فَهُوَ خَيۡرٞ لَّكُمۡ ﴾، واتە: ئەوە باشترە بۆ ئێوە، کە پەنهانی بکەن و بیدەن بە هەژاران.

٢- وە هەندێکیان دەڵێن: نەخێر واباشە بەخشین ئاشکرا بکرێ، چونکە خوا دەفەرموێ: ﴿ إِن تُبۡدُواْ ٱلصَّدَقَٰتِ فَنِعِمَّا هِيَ ﴾، واتە: ئەگەر صەدەقەو خێرو چاکەکانتان ئاشکرا بکەن، ئەوە باشترین شتە، بەڵام لەڕاستیدا بەپێی ڕواڵەتی ئایەتەکە هەردووکیان باشن، چونکە جارێکیان دەفەرموێ: باشترین شتەو جارێکی دیکەش دەفەرموێ: ئەوە بۆ ئێوە باشترە، مەسەلەکەش ئەوەیە کە جاری واهەیە واباشە بە ئاشکرا ماڵ ببەخشرێ و، جاری واش هەیە وا باشە بە پەنهانیی بێ، بۆیە ئایەتەکەی کۆتایی دەفەرموێ: ﴿ ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمۡوَٰلَهُم بِٱلَّيۡلِ وَٱلنَّهَارِ سِرّٗا وَعَلَانِيَةٗ فَلَهُمۡ أَجۡرُهُمۡ عِندَ رَبِّهِمۡ وَلَا خَوۡفٌ عَلَيۡهِمۡ وَلَا هُمۡ يَحۡزَنُونَ ﴾، ئەوانەی ماڵی خۆیان دەبەخشن، بە شەوو بە ڕۆژ، بە ئاشکراو بە پەنهان، بۆچی ؟ چونکە ماڵ بەخشین و هاوکارییکردنی خەڵك، جاری وا هەیە پێویستە یان واباشە بە ئاشکرابێ، بە تایبەتی ئەگەر

واجب بێ، کابرا زەکات دەدا، واباشە بە ئاشکرابێ، بۆ ئەوەی خەڵك گومانی خراپی پێنەبات، وەجاری وا هەیە دەبێتە سەرمەشق بۆ خەڵکی دیکەو، خەڵکی دیکە چاوی لێدەکات، وەك لە فەرموودەی (صَحیح)دا هاتوە، جارێك کابرایەك هات داوای هاوکاریی کرد، زۆر ڕووتو ڕەجاڵ دیاربوو، پێغەمبەر ﷺ دەموچاوی موبارەکی تاریك داهاتو گرژبوو، پێی ناخۆش بوو ئەو ئینسانەی وا بە هەژاریی‌و ڕووتو ڕەجاڵیی بینی، دوایی یەکێ لە مسوڵمانان هاوکارییەکی کرد، خەڵکەکەش کە لەوێ بوون ئەوانیش بەدوای ویدا هاوکاریی دیکەیان کرد، ئنجا پێغەمبەر ﷺ ڕووی موبارەکی وەك مانگێگ درەوشایەوە، وە لەو حاڵەتەدا فەرمووی: {(مَنْ سَنَّ فِي الإِسلامِ سُنَّةً حَسَنَةً، فَلَهُ أَجْرُهَا، وَأَجْرُ مَنْ عَمِلَ بِهَا بَعْدَهُ مِنْ غَيْرِ أن يُنْقَصَ مِنْ أُجُورِهِمْ شَيءٌ) (رَوَاهُ مسلم برقم: (٢٣٤٨)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٢٠٣)}، واتە: هەرکەسێك چاکەیەك دابێنێ، ئەوە پاداشتی خۆی هەیە، وە پاداشتی هەموو ئەوانەی هەیە کە کار بەو چاکەیە دەکەن {کە ئەو دایهێناوەو ئەو دەستپێشخەریی بۆ کردوە} بەبێ ئەوەی لە پاداشتی ئەوان کەمبێتەوە، {بەقەدەر هەمووان پاداشتی هەیە}.

شایانی باسیشە هەندێك لە زانایان بە هەڵە ئەم فەرمایشتەیان کردۆتە بەڵگە لەسەر بیدعەی چاك (البدعة الحسنة)و گوتوویانە: لێرەدا پێغەمبەر ﷺ مەبەستی ئەوەیە هەرکەسێك بیدعەیەکی باش دابێنێ‌و، هەرکەسێك دوایی ئیش بەو بیدعە چاکە بکات، ئەوە پاداشتی هەموویانی هەیە !! بەڵام لەڕاستیدا وانیە، چونکە وەك چۆن ئایەت هۆی هاتنە خوار (سَبَب النزول)ی هەیە، فەرموودەکانی پێغەمبەریش هۆی گوتران (سَبَب الورود)یان هەیە، جا پێغەمبەر ﷺ لەو مەقامەدا کە فەرموویەتی: {هەرکەسێك چاکەیەك دابێنێ}، مەبەستی بیدعە نەبووە، بەڵکو مەبەستی ئەوە بووە کە دەستپێشخەریی بکات بۆ چاکەیەك، چونکە بێگومان هاوکارییکردنەکەی ئەو مسوڵمانە بۆ پیاوە هەژارەکە، بیدعەت نەبووە دایهێناوە، بەڵکو تەنیا هاوکاریی کردوە، کەواتە: مەبەست لە ڕێبازێکی باش (سُنَةً حَسَنَةً) خودی هاوکارییکردنەکە بووە، جا

جاری وایە، واباشە هاوکارییکردن ئاشکرابێ، بۆ ئەوەی کە خەڵکی دیکە تەماشای بکات، چ لەبەرئەوەبێ کە ماڵ بەخشینەکە واجبە، یان لەبەر هەر هۆیەکی دیکەبێ، کە ماڵ بەخشینەکە ئەگەر بە ئاشکرابێ، باشتر ئامانجی خۆی بپێکێ، وە جاری وایە وا باشە کە بە پەنهانیی بێو، دەبێ بابای بەخشەر حەکیمو لێزانو بە سەلیقە بێو، کاتی گونجاوو شێوەی گونجاو بۆ ماڵ بەخشینەکەی بدۆزێتەوە، ئەگەر پێویستی کرد ئاشکرای بکاتو، ئەگەر پێویستی نەکرد پەنهانیی بکات، وە ئەگەر واباش بوو با بە شەوبێو، واباش نەبوو، با بە رۆژبێ، پێغەمبەریش ﷺ لەوبارەوە فەرموویەتی: {(أَفْضَلِ صَلاَةِ الْمَرْءِ فِي بَيْتِهِ إِلاَّ الْمَكْتُوبَةَ) (رَوَاهُ الْبُخَارِيُّ برقم: (٧٣١)، وَمسلم برقم: (١٨٢٢)، عَنْ زَيدِ بنِ ثَابِتٍ رضي الله عنه}، واتە: باشترین نوێژی ئینسان ئەوەیە کە لە ماڵەوە بیکات جگە لە فەرزەکان، بۆچی لە ماڵەوە بێ؟ لەبەرئەوەی خەڵك هەستی پێ ناکات، کەواتە: وەك چۆن نوێژ جگە لە فەرز ئەوی دیکە واباشە لە ماڵێ بێ، بەڵام فەرزەکە دەبێ بە ئاشکرابێ، دەگونجێ بڵێین: ماڵ بەخشینیش جگە لە زەکات کە واجبەو دەبێ بە ئاشکرابێ، ئەوی دیکە ئەگەر بە پەنهانیی بێ رەنگە باشتربێ، بەڵام وەك گوتم: ماڵ بەخشینی سوننەتیش دیسان حاڵەتی جۆراو جۆری هەیە، هەروەها پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {(إِنَّ الَّذِي يَجْهَرُ بِالْقُرْآنِ كَالَّذِي يَجْهَرُ بِالصَّدَقَةِ وَالَّذِي يُسِرُّ بِالْقُرْآنِ كَالَّذِي يُسِرُّ بِالصَّدَقَةِ) (رَوَاهُ النَّسَائِي برقم: (١٦٦٣)، عَنْ عُقْبَةَ بْنَ عَامِرٍ رضي الله عنه، وَصحَّحهُ الألباني}، واتە: ئەو کەسەی کە قورئان بە دەنگی بەرز دەخوێنێ، وەك ئەوەیە کە خێرو چاکە بە ئاشکرا دەکات، وە ئەوەی کە قورئان بە دەنگی نزم دەخوێنێ، وەك ئەوە وایە کە خێرو چاکە بە پەنهانیی دەکات، کە دیارە جاری وا هەیە وا باشە بە دەنگی بەرز قورئان بخوێندرێو، جاری واش هەیە وا باشە بە دەنگی نزم، بۆ وێنە: ئەگەر نوێژکەر لەگەڵ ئیمامدا نوێژی کرد، دەبێ قورئانەکەی بە دەنگی نزم بخوێنێ، وە جاری وا هەیە ئەگەر بەتەنیاش نوێژی کرد لە ماڵێ لە نوێژە (جَهْرِي)یەکاندا، سوننەتە

کە دەنگ بەرز بکاتەوە، جا وەك چۆن نوێژکردن جاری وایە دەبێ بە دەنگی نزم قورئانەکە بخوێندرێو، جاری وایە بە دەنگی بەرز، بە هەمان شێوە ماڵ بەخشینیش جاری وایە بە ئاشکراو، جاری واش هەیە بە پەنهان، هەروەها پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {(صَدَقَةُ السِرِّ تُطْفِيءُ غَضَبُ الرَّبِ) (رَوَاهُ الطَبَرانِي عَن بهز بن حكيم عن أبيه عن جدّهِ رضي الله عنه، وَصَحَّحَهُ الألباني في (صحيح الجامع) برقم: (١٨٧١)}، واتە: ماڵ بەخشینی پەنهان تووڕەیی پەروەردگار دەکوژێنێتەوەو لایدەبا، (واتە: خوا زۆری پێ خۆشە).

**مەسەلەی چواردەیەم:** کە دەفەرموێ: ﴿وَيُكَفِّرُ عَنكُم مِّن سَيِّـَٔاتِكُمْ﴾،

لە دوای نەزرو ماڵ بەخشینی بە پەنهانو بە ئاشکرا دەفەرموێ: لە گوناهەکانتان لێتان دەسڕێتەوە، ئەوەی لێوەردەگیرێ کە ئینسان، چ بە ئاشکرا، چ بە پەنهان ماڵی خۆی ببەخشێ، دەبێتە هۆی ئەوەی کە گوناحو تاوانەکانی لێ بسڕێتەوە، هەندێکیشیان گوتوویانە: ئەوە تایبەتە بە ماڵ بەخشینی پەنهانەوەو، هەندێکیشیان گوتوویانە: تایبەتە بە ماڵ بەخشینی ئاشکراوە، بەڵام لەڕاستیدا بۆ هەردووکیان دەچێتەوە.

**مەسەلەی پازدەیەم:** کە دەفەرموێ: ﴿لَّيْسَ عَلَيْكَ هُدَىٰهُمْ﴾، لە دوای باسی ماڵ بەخشین دەفەرموێ: هیدایەتدانی ئەو خەڵکە لەسەر تۆ نیە، ئەمە ئەوەی لێوەردەگیرێ، کە ئینسانی مسوڵمان کە ماڵی خۆی دەبەخشێ، نابێ بیبەستێتەوە بەوەوە کە حەتمەن دەبێ ئەو ئینسانە بەپێی دڵی ئەو بێت، بەڵکو جاری وایە ئەگەر ماڵ بەخشینەکە سوننەت بێ، با ئەو کەسە مسوڵمانیش نەبێ، هەر دروستە پێی ببەخشی، مادام ئاتاجو لێقەوماوە، بە بەڵگەی ئەوە، کە خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿لَّا يَنْهَىٰكُمُ ٱللَّهُ عَنِ ٱلَّذِينَ لَمْ يُقَٰتِلُوكُمْ فِى ٱلدِّينِ وَلَمْ يُخْرِجُوكُم مِّن دِيَٰرِكُمْ أَن تَبَرُّوهُمْ وَتُقْسِطُوٓا۟ إِلَيْهِمْ ...﴿٨﴾﴾ الممتحنة، واتە: خوا لێتان قەدەغە ناکات سەبارەت بەو کافرانەی کە خوا لە ماڵو حاڵتان وەدەریان نەناون، وە لەسەر دینتان شەڕتان لەگەڵدا ناکەن، کە لەگەڵیاندا چاکەکار بن،

وە لەگەڵیان بەخشندە بن‌و لە ماڵی خۆتانیان پێ بدەن، بەڵام زۆر لە زانایان دەڵێن زەکات‌و ماڵی فەرز تەنیا بە مسوڵمانان دەشێ‌و نابێ بدرێ بە ئینسانی بێ بڕوا، هەرچەندە هەندێکیان دەڵێن: نەخێر زەکات بە ئینسانی کافرو بێبڕواش هەر دەشێ، جا ئەوانەی کە دەڵێن: زەکات تەنیا دەبێ بدرێ بە مسوڵمانان، ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەر ﷺ بە بەڵگە دێننەوە کە فەرموویەتی: {(أُمِرتُ أَنْ آخُذَ صَدَقَةً مِن أَغْنِيائِهم وأَرُدَّها في فُقَرائِهم) (مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ)، البخاري: (١٣٩٥)، و مسلم: (١٩)، وأبو داود والنسائي والترمذي وابن ماجه وأحمد}، واتە: فەرمانم پێ کراوە، کە زەکات لە دەوڵەمەندەکانی مسوڵمانان وەربگرم، وە بیدەمەوە بە هەژارەکانیان، ئەوانەش کە دەڵێن دروستە بدرێ بە خەڵکی نامسوڵمانیش، ڕواڵەتی ئایەتەکە بە بەڵگە دێننەوە، بەڵام وا پێدەچێ ئەو ڕایەی دیکە ڕاستتربێ، چونکە زەکات یەکێکە لە پێنج پایەکانی ئیسلام‌و دەبێ لەنێو مسوڵماناندا جێبەجێ بکرێ‌و، تەنیا بدرێ بە مسوڵمانان، بەڵام خەڵکی نامسوڵمان دەگونجێ لە ماڵی دیکە غەیری ئەوەی کە زەکاتەوفەرزە، لەوە هاوکاریی بکرێن، بەڵام ئایا بابای گوناهبارو فاسق کە نوێژ ناکات، یان ڕۆژوو دەخوات، یان بەناوبانگە بەوەی کە گوناهێك دەکات، ئایا زەکاتی پێدەشێ یان نا ؟ وە ماڵی دیکەی پێ دەشێ یان نا ؟ ئەوەی کە لە ئایەتەکان‌و فەرمایشتەکان وەردەگیرێ، ئەوەیە کە پێی دەشێ، بەڵام ئەگەر هات‌و ئینسانێکی چاکەکار لەگەڵ یەکێکی خراپەکار هەبوون، هەردووکیان وەك یەك موحتاج بوون، دیارە لەو حاڵەتەدا واباشترە بدرێ بە چاکەکارەکە، هەرنەبێ بۆ ئەوەی ئەو کەسەی کە بێدینە یاخود گوناهبارە، بەخۆیدا بچێتەوە، وە بزانێ کە لە خێرو چاکەی مسوڵمانان بێبەش دەبێ، بەهۆی گوناهباریی‌و خراپەکارییەکەیەوە، بەڵگەش لەسەر ئەوە کە ماڵی زەکات‌و خێرو چاکە بە ئینسانی گوناهباریش دەشێ، ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەرە ﷺ کە بوخاریی موسلیم[1] گێڕاویانەتەوەو ئەوە کورتەی ماناکەیەتی: کابرایەك دەیەوێت خێرو چاکە بکات، یان زەکات بدات جارێك دەیدا بە ئافرەتێکی زیناکەر جارێکی دیکە دەیدا بە پیاوێکی دەوڵەمەند

١) البخاري: (١٤٥١)، و مسلم: (١٠٢٢).

جارێکی دیکە دەیدا بە پیاوێکی دز، جا کە دەیدا بە ئافرەتە زیناکەرەکە، خەڵك باسی دەکەن‌و دەڵێن: دەفەرمووو خێرو چاکەی خۆیدا بە ئافرەتێکی داوێن پیس ! ئەویش وا دەزانێ، کە لە قیسی چووە، دەڵێ: ستایش بۆ خوا، ئەمجارە دەیدەم بە موستەحەقی خۆی، بۆ جاری دووەم دەیدا بە دەوڵەمەندێك دیسان خەڵك زەمی دەکەن‌و دەڵێ: ستایش بۆ خوا، ئەمجارە دەیدەم بە کەسێ کە پێی بشێ، جاری سێیەم دەیدا بە دزێك، دیسان خەڵکی باسی دەکەن، ئەویش دەڵێ: خوا ستایش بۆ تۆ، خێرو چاکەکەم چووە دەستی زیناکەرێك‌و دەوڵەمەندێك و دزێك !! بەڵام پێی دەگوترێ، {واتە لە خەوندا، یان بە ئیلهام} کە هەرسێك خێرو چاکەکەت بە باشترین شێوە لێوەرگیراون، زیناکەرەکە بەڵکو بەهۆی ئەو ماڵ‌و سامانەوەکە پێیدراوە بێ‌نیاز بێ لە داوێن پیسیی، دەوڵەمەندەکە بەڵکو عیبرەت وەربگرێ، لەمەودوا چیدیکە چرووکیی‌و ڕژدیی نەکاو ئامادەبێ ماڵی خۆی ببەخشێ، وە دزەکەش بەڵکو پێویستیی بە دزیی نەمێنێ‌و وازبێنێ !.

**مەسەلەی شازدەیەم:** کە خوا دەفەرموێ: ﴿ وَمَا تُنفِقُواْ مِنْ خَيْرٍ فَلِأَنفُسِكُمْ ﴾، هەر سامانێك ببەخشن بۆ خۆتانە، ئەوە لەڕاستیدا هەم دنیا دەگرێتەوە، هەم دواڕۆژیش، ئینسان هەم لە دنیادا لە بەخشینی خۆی بەهرەمەند دەبێ‌و پێی سەربەرزەو دڵی مورتاح دەبێ‌و، خەڵك بە چاکە باسی دەکەن، وە هەم لە دواڕۆژیشدا دێتەوە ڕێی‌و خوا پاداشتی دەداتەوە، وە ئەوە بەڕاستی هەم تاکیش دەگرێتەوەو، هەم خێزانیش‌و، هەم کۆمەڵگاش دەگرێتەوە، کۆمەڵگایەك کە خێرومەندبن لەنێو خۆیانداو هاوکاریی یەکدی بکەن، بۆ دنیاشیان باشەو بۆ دواڕۆژیشیان باشە.

**مەسەلەی حەڤدەیەم:** کە خوا دەفەرموێ: ﴿ وَمَا تُنفِقُونَ إِلَّا ٱبْتِغَآءَ وَجْهِ ٱللَّهِ ﴾، ئێوە ماڵی خۆتان خەرج ناکەن مەگەر بۆ داواکردنی ڕووی خوا، واتە: ڕەزامەندیی خوا، یان پاداشتی خوا، یان دیداری ڕووی خوا، لێرە ئەم تەعبیرە هەواڵە، خوا هەواڵ دەدا، دەفەرموێ: ئێوە ماڵی خۆتان نابەخشن مەگەر بۆ ئەوە کە خوا لێتان ڕازی بێ‌و، دەتانەوێ ڕەزامەندیی خوای پێ وەدەست بێنن،

واتە هەواڵە بەڵام مەبەست پێی فەرمانە، واتە: حاڵەتی ئاسایی‌و سروشتی لای مسوڵمانان ئەوەیە، کە هەر بەو شێوەیە ماڵی خۆیان دەبەخشن، تەنیا بۆ ئەوەی خوا لێیان ڕازی بێ، هیچ ئامانج‌و مەبەستێکی دیکەیان نیە، چونکە هەرکەس هەر ئامانج‌و مەبەستێکی دیکەی هەبێ، چ بۆ ماڵ بەخشین، چ بۆ هەر عیبادەت‌و طاعەتێکی دیکە، دیارە دەبێتە سەپانی پووشێ‌و[1] جگە لە پەشێمانیی شتێکی دیکەی پێ نابڕێ.

**مەسەلەی هەژدەیەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ وَمَا تُنفِقُوا۟ مِنْ خَيْرٍ يُوَفَّ إِلَيْكُمْ وَأَنتُمْ لَا تُظْلَمُونَ ﴾، هەر ماڵ‌و سامانێك ببەخشن‌و هەر خێرێك بکەن، بە تەواویی پاداشتان دەدرێتەوەو ستەمتان لێناکرێ، کە بەشێك لە پاداشتەکەتان بفەوتێنرێ، پێغەمبەر ﷺ لەوبارەوە فەرموویەتی: {(إِنَّ الـمسلم إِذَا أَنْفَقَ عَلَى أَهْلِهِ نَفَقَةً، وهُوَ يَحتَسِبُها، كانَتْ لَهُ صَدَقَةً) (مُتَفَقٌ عَلَيهِ، البُخاري برقم: (٥٣٥١)، ومسلم برقم: (٢٣١٩)، عَن أبي مَسْعُودٍ البدريِّ}، واتە: مسوڵمان ئەگەر ماڵی خەرج کرد بۆ ماڵ‌و خێزانەکەی خۆیشی، مادام مەبەستی پێ ڕازیکردنی خوا بێ، ئەوەش بۆی بەخێرو چاکە دەچێ، چونکە ئایەتەکە دەفەرموێ: ﴿ وَمَا تُنفِقُوا۟ مِنْ خَيْرٍ يُوَفَّ إِلَيْكُمْ ﴾، هەر نەفەقەیەك بکەن‌و هەر ماڵێك ببەخشن مادام مەبەستتان پێ خوا بێ، ئەگەر بۆ ماڵ‌و منداڵی خۆشتان بێ، هەر پاداشتان هەیە.

**مەسەلەی نۆزدەیەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ لِلْفُقَرَآءِ ٱلَّذِينَ أُحْصِرُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ﴾، بۆ ئەو هەژارانەی لە ڕێی خوادا حەپس بوون، واتە: لەبەر سەرگەرمییان بە خزمەتی ئیسلامەوە، جا بانگەواز بێ، جەنگ‌و جیهاد بێ، هەر خزمەتێکی دیکە بێ، وەك: بڵاوکردنەوەی زانست، فەرمان بە چاکەو ڕێگرتن لە خراپە، گرنگ ئەوەیە سەرگەرمی کارێك بن کە نیەتی خوایان لێ هێناوە، هەموو ئەوانە

---

١) جوتیار کە هیچی دەستگیر نەبوو، جگە لە پووش‌و کا، مانای وایە ڕەنج بەخسار بووە.

باشترین کەسانێکن کە هاوکاریی بکرێن، وە مسوڵمانان لە ماڵو سامانی خۆیان بەشیان بدەن، چونکە لەبەر خزمەتکردنی ئیسلامو مسوڵمانانو سەرقاڵبوونیان بە کاری ئیسلامییەوە، دەرفەتی کارو کەسابەتو هاتنو چوونیان نیە.

**مەسەلەی بیستەمو کۆتایی:** کە دەفەرموێ: ﴿ ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمۡوَٰلَهُم بِٱلَّيۡلِ وَٱلنَّهَارِ سِرّٗا وَعَلَانِيَةٗ ﴾، وەك پێشتر باسمان کرد خوا ﷻ کاتی: شەوو ڕۆژو پەنهانو ئاشکرای داناون بۆ کەسانێك کە ماڵ دەبەخشن، واتە: جاری وایە واباشە بە شەو ببەخشێو، جاری وایە بە ڕۆژ، وە جاری وایە بە ئاشکراو، جاری وایە بە پەنهانیی، وە دیاریکردنی شەو یان ڕۆژ، پەنهان یان ئاشکرا، ئەو حیکمەتەیە کە مسوڵمان دەبێ بەکاریبهێنێ لە ماڵ بەخشینی خۆیدا.

لێرەشدا دەگەینە کۆتایی ئەم دەرسەمان، خوایە بە کەرەمو بەزەیی ڕەهاو بێسنووری خۆت بە بەخششی خۆت لە غەیری خۆتو، بە ڕزقی حەلاڵت لە هی حەرام بێنیازمان بکەی ئامین.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی پەنجاو شەشەمین

## پێناسەی ئەم دەرسە

خوا پشتیوان بێ لەم دەرسەماندا ئایەتەکانی ژمارە: (٢٧٥ تاکو ٢٨١) لە سوورەتی (البقرة) دەتوێژینەوە، واتە (٧) حەوت ئایەت، لەم حەوت ئایەتەدا خوا تعالى باسی سوود خۆریی (أَكْلُ الرِّبا)، وە سزای سەختی سوود خۆران لە دوارۆژدا دەکات، وە لەمیانەدا ئەوەدا خوا تعالى باسی ماڵ بەخشینو زەکات، وە پاداشتەکەیان دەکات، وە پاشان هەڕەشەی دنیاو دوارۆژ لە سوود خۆران دەکات، ئەگەر دەستبەرداری سوود خواردن نەبن، وە دوایی باسی چاوەڕێ کردنی کەسێك کە قەرزی لەسەرەو لەبەر تەنگ دەستیی قەرزی بۆ نادرێتەوە، دەکات، وە سەرەنجام باسی ڕۆژی سزاو پاداشت وەرگرتنەوە دەکاتو بڕواداران هۆشیار دەکاتەوە کە خۆیانی بۆ سازو ئامادە بکەن.

﴿ٱلَّذِينَ يَأْكُلُونَ ٱلرِّبَوٰاْ لَا يَقُومُونَ إِلَّا كَمَا يَقُومُ ٱلَّذِى يَتَخَبَّطُهُ ٱلشَّيْطَٰنُ مِنَ ٱلْمَسِّۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَالُوٓاْ إِنَّمَا ٱلْبَيْعُ مِثْلُ ٱلرِّبَوٰاْۗ فَمَن جَآءَهُۥ مَوْعِظَةٌ مِّن رَّبِّهِۦ فَٱنتَهَىٰ فَلَهُۥ مَا سَلَفَ وَأَمْرُهُۥٓ إِلَى ٱللَّهِۖ وَمَنْ عَادَ فَأُوْلَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِۖ هُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿٢٧٥﴾ يَمْحَقُ ٱللَّهُ ٱلرِّبَوٰاْ وَيُرْبِى ٱلصَّدَقَٰتِۗ وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ كُلَّ كَفَّارٍ أَثِيمٍ ﴿٢٧٦﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَأَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَوُاْ ٱلزَّكَوٰةَ لَهُمْ أَجْرُهُمْ عِندَ رَبِّهِمْ وَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿٢٧٧﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَذَرُواْ مَا بَقِىَ مِنَ ٱلرِّبَوٰٓاْ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿٢٧٨﴾ فَإِن لَّمْ تَفْعَلُواْ فَأْذَنُواْ بِحَرْبٍ مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦۖ وَإِن تُبْتُمْ فَلَكُمْ رُءُوسُ أَمْوَٰلِكُمْ لَا تَظْلِمُونَ وَلَا تُظْلَمُونَ ﴿٢٧٩﴾ وَإِن كَانَ ذُو عُسْرَةٍ فَنَظِرَةٌ إِلَىٰ مَيْسَرَةٍۚ

وَأَن تَصَدَّقُواْ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿٢٨٠﴾ وَٱتَّقُواْ يَوْمًا تُرْجَعُونَ فِيهِ إِلَى ٱللَّهِ ثُمَّ تُوَفَّىٰ كُلُّ نَفْسٍ مَّا كَسَبَتْ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴿٢٨١﴾ ﴾.

## مانـای وشـه به وشـەی ئایەتەکـان

((ئەوانەی سوود دەخۆن (لە ڕۆژی قیامەتـدا) هەڵناستنەوە، مەگەر وەك چۆن ئـەو کەسـە هەڵدەستێ کـە شـەیتان بـەهۆی دەسـت لێوەشـاندنەوە وای لێکـردوە بەملاولادا بکەوێت، ئەوەش لە سۆنگەی ئەوەوە کە دەیانگوت: کڕین و فرۆشتن وەك ڕیبا وایـە، بەڵام خوا کڕین و فرۆشتنی حەڵاڵکردوەو ڕیبای قەدەغـە کـردوە﴿٢٧٥﴾ جا هەرکەسێك ئامۆژگـاریی لـە پەروەردگارییـەوە بۆبـێ و دەسـت هـەڵبگرێ (لـە سـوود خۆریی)، ئەوە لـەوەی ڕابردوە دەبووردرێ و (سەرەنجامی) کارەکەی بەدەست خوایە، بەڵام هەرکەسێك بگەڕێتەوە سەر سوود خۆریی، ئەوە ئەوانە هاوەڵی ئاگـرن و تێیدا هەمیشـەیی دەبـن ﴿٢٧٦﴾ خوا ڕیبا بێ پیزو نابوود دەکات و خێرو چاکەکان گەشە پـێ دەدات، وە خوا هەر سپڵەیەکی گوناهباری خۆشناوێ ﴿٢٧٧﴾ بێگومان ئەوانەی بڕوایـان هێنـاوەو چـاکەکان ئـەنجام دەدەن و نوێـژ بـەرپا دەکـەن و زەکـات دەدەن، پاداشـتی خۆیانیان لەلای پەروەردگـاریان هەیە، هیچ ترسێکیان لەسـەرنیەو هەرگیـز خەمبار نابن ﴿٢٧٨﴾ ئەی ئەوانەی بڕواتان هێنـاوە ! پـارێز لـە خـوا بکەن و ئەوەنـدە سوودەی (لەسەر قەرزدارەکان) ماوە وازی لـێ بێـنن، ئەگـەر ئێـوە بەڕاسـتی بـڕوادارن ! ﴿٢٧٩﴾ وە ئەگەر وانەکەن، ئەوە ئاگادارکران بە جەنگێك لە خـواو پێغەمبەرەکەیـەوە ! وە ئەگەر پەشێمانـبوونەوە، ئـەوە سـەرمایەکانتان بۆخۆتـان (بـەبێ سـوود) نـە سـتەم دەکەن و نە سـتەمیشـتان لێدەکرێ ﴿٢٨٠﴾ وە ئەگەر (بابـای قـەرزدار) تەنگدەسـت بوو، ئەوە چاوەڕێی بکەن هەتا بۆی ئاسـان دەبێ، وە ئەگەر خێریـش بکەن (چاوپۆشـیی لە قەرزەکە بکەن) ئەوە ئەگەر بزانن بۆتـان باشـترە، وە پارێز لە ڕۆژێـك بکـەن کە تێیـدا بۆ لای خـوا دەگێـڕدرێنـەوە، وە هەرکەسـە بـەپێی ئـەوەی کردوویـەتی (لـە چاکەو خراپە) سزاو پاداشت دەدرێتـەوە، بێئـەوەی سـتەمیان لـێ بکرێ ﴿٢٨١﴾)).

## شیکردنەوەی هەندێك لە وشەكان

(ٱلرِّبَوٰاْ): ڕیبا لە کوردیدا بە سوود، یان سوود خۆریی لێکدراوەتەوە، بەڵام لە زمانی عەرەبیدا بە مانای زێدە، زیاد بوون، گەشەکردن دێ، (ربا: زادَ وَعَلا)، واتە: زیادی کردو بەرز بۆوە، وە لە زاراوەی شەرعییدا، ڕیبا ئاوا پێناسە کراوە: (الرِّبَا: فَضلٌ مَالِ عَنْ عِوَضٍ شُرِطَ لأَحَدِ المُتَعَاقِدين) واتە: بریتیە لە ماڵێکی زیادە، کە لە بەرانبەریدا هیچ قەرەبوویەك نیە، بۆ یەکێك لە دوو کەسەکان کە بەیەکەوە مامەڵەیان کردوە، بە مەرج گیراوە.

(يَتَخَبَّطُهُ): (الخَبْطُ: الضَّرْبُ عَلَى غَيرِ اسْتِوَاءٍ، كَخَبْطِ البَعيرِ الأرضَ بِيَدِهِ، والرَّجُلِ الشَّجَرَ بِعَصَاهُ)، واتە: وشەی (خَبْط) بریتیە لە ڕۆیشتنێکی ناهاوسەنگ، یاخود لێدان لە شتێك بە شێوەیەکی نارێك، وەك وشتر کە بەپێی زەوی دا دەکوتێ، یاخود پیاوێك کە بە گۆچان لە درەخت دەدات بۆ ئەوەی گەڵای لێبکاتەوە بە شێوەیەکی نارێك.

(مِنَ ٱلْمَسِّ): (المَسُ: كِنَايَةٌ عَنِ الجنُونِ) واتە: (مَسّ) مەبەست پێی شێتیە، (والمَسُّ يُقَالُ في كُلِّ ما يَنالُ الإنسَانَ مِن أذىً) واتە: (مَسّ) لە زمانی عەرەبیدا بە هەر ئازارێك دەگوترێ کە تووشی ئینسان ببێ، بەڵام لێرەدا مەبەست پێ شێتییە، یاخود دەست لێ وەشێنرانە لەلایەن شەیتانەوە، وە بە عەرەبی (مَمْسُوس) واتە: دەست لێوەشێنراو (مَجنُون).

(ٱلْبَيْعُ): (البَيْعُ: إعْطاء المُثْمَنِ وَأَخذ الثَّمَن، والشِّرَاء: إعْطَاء الثَّمَن وأَخذ المُثْمَنِ)، (البَيْعُ والشِّرَاء) پێچەوانەی یەکدین، (بَيْعُ) بریتیە لە دانی شتێك کە نرخی دراوەو وەرگیراوەو، (شِرَاء) بریتیە لە وەرگرتنی شتێك کە نرخی لەسەر دانراوە، وە دانی نرخەکە، وە کوردەواریی خۆمان بەو دووانەی ئەو کارە دەکەن دەڵێن: کڕیارو فرۆشیار، (البَيْعُ) واتە: فرۆشتن (الشِّرَاء) واتە: کڕین.

(يَمۡحَقُ ٱللَّهُ): خوا نابوود دەكات، لە بەین دەبا، دەڵێ: (المَحْقُ: النُّقصانُ، ومِنهُ: المَحَاقُ، الشَّهْرِ إذا انمحَقَ الهِلالُ، مَحقَهُ: إذا نَقَصَهُ وأذهَبَ بَرَكَتَه) واتە: (محْقُ) بە مانای كەمكردن دێ، وە بۆیە بە كۆتایی مانگ دەگوترێ: (محَاقُ) كە وردە وردە بچووك دەبێتەوە، كاتێك دەگاتە كۆتایی مانگ، (مَحقَهُ) واتە: بەرەكەتی تێدا نەهێشتو لە بەینی برد.

(وَيُرۡبِي): (أربَى الشيءَ: نَمّاهُ وزادَهُ) واتە: ئەو شتەی گەشە پێداو زیادی كرد.

(كَفَّارٍ): (الكفّار أبْلَغُ مِنَ الكَفُورِ، والكفور المبالغ في الكُفرَان بِنِعْمَةٍ) (الكفّار) واتە: ئینسانی زۆر كوفركەر لە وشەی (الكَفُورِ) زیاتر زێدەڕۆیی تێدا هەیە، (كَفُورِ) كەسێكە بەرانبەر نیعمەت زۆر سپڵەیە، بەڵام (الكفّار) زیاتر بۆ سپڵەیی بەكاردێ بەرانبەر نیعمەتەكان، وە بەمانای بێبڕواش بەكاردێ.

(فَأۡذَنُواْ): واتە: ئاگاداربن، (أذِنتهُ بِكَذَا وَآذنتهُ: أعْلَمْتُهُ) ئاگادارم كرد بە فڵانە شت، واتە زانیاریم پێداو هۆشیارییم پێدا، كە تۆ ئاگادار بە.

(بِحَرۡبٍ): (حَرب) لە كوردیدا واتە: جەنگ (الحَرْبُ: القِتالُ بَيْنَ فِئَتَيْنِ، وهِيَ مؤنَثَة وقَدْ تُذَكّرُ عَلَى مَعْنَى القِتَالِ) واتە: (حَرب) بریتیە لە جەنگ لە نێوان دوو كۆمەڵدا، وە (حرْب) (مُؤَنَّث)ە، بە (مُؤَنّث)ی مەجازیی، وە جاری وا هەیە، ئەگەر مانای جەنگی لێبگیرێ، بە (مُذَكّر)یش دادەنرێ.

(ذُو عُسۡرَةٍ): واتە: تەنگ دەست، چونكە (عُسْر) واتە بە زەحمەت، (ذُو عُسْرَةٍ) واتە: كەسێك كە لە حاڵەتی تەنگ دەستیی دایە، دەڵێ: (العُسْرُ: نَقِيضُ اليُسْرِ. والعُسْرةُ: تَعَسُّرُ وجودِ المَالِ وأعْسَرَ: أضَاقَ)، (عُسْر) واتە: بە زەحمەت پێچەوانەی (يُسْرَ)ە، واتە: ئاسانیی، جا (عُسْر) بریتیە لەوەی كە مرۆڤ ماڵی بە زەحمەت بۆ پەیدابێ، وە دەگوترێ: (وأعْسَرَ: أضَاقَ) واتە: دەستی تەنگ بوو.

(فَنَظِرَةٌ): (النَّظَـرُ: الإنتِظَـارُ، يُقَـالُ: نَظَرْتُـهُ وانتَظَرْتُـهُ وأنْظَرْتُـهُ. أي أخَّرْتُـهُ) (نَظِرَة) واتـە: (الإنتِظَـارُ) چاوەڕێ كـردن، (النَّظَرُ)و (الإنتِظَارُ) هەر يـەكن، واتە: چاوەڕێ كردن، لە زمانی عەرەبیدا دەڵێن: (نَظَرْتُهُ وانتَظَرْتُهُ وأنْظَـرْتُهُ، أي أخَّرْتُـهُ) واتـە: چاوەڕێـم كـردو دوامخسـت.

(مَيْسَرَةٍ): (الـمَيْسَرَةُ: عِبارةٌ عَنِ الغِنَى)، (مَيْسَرَة) واتـە: ئاسـانیی، كـە مەبەسـت پێی دەوڵەمەندییـە.

## هـۆی هاتنــە خوارەوەی ئایەتەكــان

١) هۆی هاتنە خواری ئەو ڕستە قورئانیەی كە دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَذَرُواْ مَا بَقِيَ مِنَ ٱلرِّبَوٰٓاْ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴾، ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! پارێز لە خوا بكەن، وە دەست هەڵگرن لەو سوودەی كە ماوە ئەگەر بڕوادارن واتە: لەو سوودەی كە ماوتانە لەسەر ئەو كەسانەی كە مامەڵەتان لەگەڵیاندا كردوە، لەوبارەوە دوو بەسەرهات گێڕراونەوە:

أ- {(أَخْرَجَ ابن جرير وابن الـمُنذر وابن أبي حَاتم عَنْ السُدّي قَالَ: نَزَلَتْ في العباس بن عَبدالـمطَلب وَ رجل مِنْ بَني الـمُغَيرَةَ وَهُوَ خَالِد بن الوَليد كَانا شريكين في الجَاهِلِيَةَ، يُسْلِفَان إلى ناسٍ مِن ثَقِيف فَجَاءَ الإسلام وَلَهُمَا أموَال عَظِيمَة في الرِّبَا، فَأَنْزَلَ الله تعالى هَذِهِ الآية)}[1]، واتـە: ئەم ئایەتـە دەربارەی عەبباسی كوڕی (عبدالـمطلب) {مامی پێغەمبەر ﷺ}وە پیاوێك لە بەنی موغەیرە {كە نەیسابووریی دەڵێ: خالیدی كوڕی وەلید بووە} لە سەردەمی نەفامییدا هاوبەش بوون، ماڵیان بە قەرز دەدایە كەسانێك لە تیرەی (ثقيف)، كاتێ ئیسلام هات ئەوانە ماڵو سامانێكی زۆریان لە ڕیبا لەسەر ئەو كەسانە بوو كە پارەیان پێدابوون بە سوود، ئنجا خوای ئەم ئایەتـەی نـاردە خوارێ:

---

١) (أسباب النزول) للنيسابوري، ص (٦٤- ٦٥)، وفتح القدير للشوكاني ج: (١)، ص: (٣٨٦-٣٨٧).

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَذَرُواْ مَا بَقِيَ مِنَ ٱلرِّبَوٰٓاْ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ ﴾.

ب – بەسەرهاتێکی دیکەش لەوبارەوە ئەمەیە: {(وَأَخْرَجَ ابن جَرير عَنْ ابن جُريج قَالَ: كَانَتْ ثَقيف قَدْ صَالَحَت النَّبيَّ ﷺ عَلَى أنَّ مَالَهُم مِنَ رِباً عَلَى النَّاسِ يأخذونه، وَمَا كَانَ للنَّاس عَلَيْهِم مِنَ رِباً فَهُوَ مَوضُوع، فَلَمَّا كَانَ الفَتْح استعمَل عَتَّاب ابن أُسَيد عَلَى مَكَة وَكَانَت بَنو عمرو بن عوف يأخذُونَ الرِّبا مِن بَني المُغيرة وَكَانَ بَنو المُغيرة يربون لَهُم في الجَاهِلِيَة، فَجَاءَ الإسلام وَلَهُم عَلَيْهم مال كَثير، فأتاهُم بَنو عمرو يطلبون رِباهُم فأبى بَنو المُغيرة أنْ يعطوهُم في الإسلام، ورفعوا ذَلِكَ إلى عَتَّاب بن أُسَيْد فَكَتَب عَتَّاب إلى رَسُولِ الله ﷺ فَنَزَلَتْ هَذِهِ الآيَة فَكَتَب بِها رسُول الله إلى عتَّاب وَقَالَ إنْ رَضُوا وإلاَّ فَلآذنَهُم بِحَرب)}[1]، واتە: هۆزی (ثقيف) کاتی خۆی ڕێککەوتنیان لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ کردبوو کە ئەو ڕیبایەی لەسەر خەڵکیانە دەبێ وەریبگرن، بەڵام ئەگەر خەڵك ڕیبای لەسەروان بێ دەبێ لەسەریان لابچێ {کاتی خۆی کە مسوڵمان بوو بوون ئاوا صوڵحیان لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ کردبوو، ئەو مەرجەیان هەبوو}، ئنجا کە فەتحی مەککە کرا عەتتابی کوڕی ئوسەید کرا بە والی (سەرپەرشتیاری) مەککە، هۆزێك بەناوی بەنو عەمری ئیبنو عەوف عادەتیان وابووە ڕیبایان لە هۆزی بەنو موغەیرە وەرگرتوە، بەنو موغەیرەش لە سەردەمی نەفامییدا سوودیان داونێ لە بەرانبەری ئەو قەرزەدا کە لەسەریان بووە، کاتێك ئیسلام هاتوە بەنو عەمری ئیبنو عەوف قەرزێکی زۆریان لەسەر بەنو موغەیرە بوو، بەنو عەمر هاتن داوایان کرد کە ئەو ماڵەی لەسەریانە بەهۆی ڕیباوە بیانەدەنێ، بەنو موغەیرە گوتوویانە: (ئێمە تازە مسوڵمان بووین و ئێستا وەزعێکی دیکە لە گۆڕێ یە) لە ژێر سایەی حوکمی ئیسلامدا ناتانەدەینێ، ئەوەیان بەرزکردۆتەوە بۆلای عەتتابی کوڕی ئوسەید، داخۆ چی بڕیار دەدات؟ ئەویش نامەی نووسیوە بۆ پێغەمبەر ﷺ،

١) (أسباب النزول) للنيسابوري، ص: (٦٤ - ٦٥)، وە (فتح القدير) للشوكاني: ج (١)، ص (٣٨٦ - ٣٨٧)، وە (لُباب النقول في أسباب النزول) للسيوطي: (١٨٦)، ص: (٤٩).

لەو کاتەشدا ئەو ئایەتە هاتە خوارو، پێغەمبەریش ﷺ ئەم ئایەتەی بە نامەیەك ناردوە بۆ عەتتاب، وە فەرموویەتی: ئەگەر ڕازیبوون دەست هەڵگرن لەو سوودو ڕیبایە، باشە ئەگەرنا ئاگاداریان دەکەمەوە کە لە شەڕدان لەگەڵ ئیسلامدا، {دیارە دوایی بە ناچاریی دەستیان لێ هەڵگرتووە}.

٢) دەربارەی ئەم ڕستە قورئانییەش کە دەفەرموێ: ﴿ وَإِن كَانَ ذُو عُسْرَةٍ فَنَظِرَةٌ إِلَىٰ مَيْسَرَةٍ ﴾، واتە: ئەگەر بابای قەرزدار تەنگ دەست بوو، با چاوەڕێ بکرێ، تاکو دەستی دەکرێتەوەو ماڵی پەیدادەبێ‌و دەتوانێ قەرزەکە بداتەوە، {یانی: ئەوە هیچ ئەو ئەندازەیەی کە بە سوود چۆتە سەری، دەبێ چاوپۆشیی لێ بکرێ‌و لە فەرمانی خوا ﷻ لەسەری لاچووە، دەست مایەو سەرمایەکەش کە وەك قەرز لەسەریەتی، ئەوەش دەبێ چاوەڕێ بکرێ تاکو ماڵێکی پەیدادەبێ}، لەوبارەوە ئەم بەسەرهاتە هەیە: {(قَالَ الكَلْبِي: قَالَتْ بنو عمرو بن عمير لبني المُغيرة: هاتوا رُؤوس أَمْوَالنا ولَكُم الرِّبا نَدَعه لَكُم، فَقَالَتْ: بنو المُغَيرةَ نَحْنُ اليَوْمَ أَهلَ عُسْرةٍ فأَخِّرونا إلى أن تُدْرَك الثَمَرَةُ، فَأَبَوْا أن يؤخِّروهُم، فَأَنْزَلَ اللهُ تَعَالى هَٰذِهِ الآية: ﴿ وَإِن كَانَ ذُو عُسْرَةٍ ... ﴾)}[1]، واتە: کەلبیی دەڵێ: بەنو عەمری کوڕی عومەیر بە بەنو موغەیرەیان گوت: {کە قەرزیان لەسەریان بوو بە ڕیباوە دوای ئەوەی خوا ڕیبایەکەی لەسەر لابردن} باشە دەستمایەکانمان بدەنەوە {ئەوەی دیکەتان بە هەرحاڵ لەسەر لاچووەو دەستمان لێ هەڵگرتوە} بەنو موغەیرە گوتیان: ئێستا تەنگ دەستیین‌و ماڵمان نیە بتاندەینەوە، چاوەڕێمان بکەن هەتاکو بەرو میوەمان بۆ پێدەگات {ئەو کاتەی قەرزەکەتان دەدەینەوە} ئەوانیش ڕازی نەبوون چاوەڕێیان بکەن، ئیدی خواش ئەم ئایەتەی ناردەخوار کە دەفەرموێ: ﴿ وَإِن كَانَ ذُو عُسْرَةٍ فَنَظِرَةٌ إِلَىٰ مَيْسَرَةٍ ﴾، ئەگەر بابای قەرزدار تەنگ دەستبوو پێی نەدرایەوە، چاوەڕێی

---

١) (أسباب النزول) للنيسابوري، ص: (٦٥ - ٦٦).

بکەن‌و هەڵیمەپێچن هەتا حاڵەتی ئاسانیی.. جا ئایا ئەوە بۆ هەموو قەرزێکە یاخود تەنیا بۆ قەرزێکە کە بە ڕیبا دراوە؟ وا پێدەچێ تایبەت بێ بەو حاڵەتەوە، وەك فەرزبوون، هەڵبەتە بابای خاوەن قەرز ئەگەر چاوەڕێی بابای قەرزدار بکات لە هەموو حاڵاندا پەسندو باشە، بەڵام مەرج نیە لەسەری فەرزبێ‌و خاوەن قەرز بۆی نەبێت داوای قەرزەکەی بکاتەوە.

## مانای گشتی ئایەتەکان

خوای بەرزومەزن پاش باسکردنی ماڵبەخشین دێتە سەر باسی سوود خۆریی کە شتێکی حەرام‌و خراپەو دژو پێچەوانەی ماڵ‌و سامان لە ڕێی خوادا بەخشینە، چونکە لەڕاستیدا سوود خۆریی خەلچك چەوساندنەوەو خوێنمژینە، وە دەفەرموێ: ﴿ٱلَّذِينَ يَأۡكُلُونَ ٱلرِّبَوٰاْ لَا يَقُومُونَ إِلَّا كَمَا يَقُومُ ٱلَّذِي يَتَخَبَّطُهُ ٱلشَّيۡطَٰنُ مِنَ ٱلۡمَسِّ﴾، خوای پەنهانزان لێرەدا هەواڵمان پێدەدات کە سەرەنجامی سوود خۆران چۆنە ؟ جا هەندێك لە توێژەرەوانی قورئان دەڵێن: لێرەدا مەبەست پێی سەرەنجامی دنیایەو هەندێك دەڵێن: مەبەست پێی سەرەنجامی دواڕۆژە، بەڵام من وای بۆ دەچم کە هەر دووکیان دەگرێتەوە، چونکە ئایەتەکە بەگشتی فەرموویەتی: ئەوانەی سوود دەخۆن هەڵناستن مەگەر وەك ئەو کەسەی کە شەیتان وای لێکردوە بەولاولادا بکەوێ، بە خۆتان دەبینن ئینسانێکی شێت چۆن دەڕوا، بەولاولادا دەکەوێ، بێ سەرو بەرە، لە ئەنجامی ئەوەدا کە دەستی لێ وەشێنراوە، جا دوایی دێینە سەر باسی ئەوە، کە ئایا دەست لێوەشاندنی شەیتان بۆ ئینسان هەیە یان نیە ؟ باسی دەکەین، بەڵام لێرە خوا ﷻ وێنەی بابای سوود خۆر بە کێ دێنێتەوە ؟! بەکەسێك کە شەیتان دەستی لێوەشاندوەو حاڵەتێکی نائاسایی هەیەو بەولاولادا دەکەوێ، دەفەرموێ: ئاوا نەبێ هەڵناستن‌و ئاوا هەڵدەستنەوە، جا هەندێك گوتوویانە: مەبەست پێی هەڵسانەوەی قیامەتێیەو هەندێك دەڵێن: نەخێر بەڵکو مەبەست پێی ژیانی دنیاشیانەو، ژیانی دنیاشیان بەو شێوەیەی لێدێ، ئەوانەی سوود دەخۆن وەزعی دنیاشیان ئاوا تێکدەچێ، وە

من پێم وایە مەبەست هەردووکیانەو سیستەمی سوود خۆریی (النظام الربوي) هەم لە دنیادا ژیانی ئابووریی و کۆمەڵایەتی خەڵك تێك دەداتو وەك خەڵکی شێتو دەست لێوەشێنراویان لێدێ، وە هەم لە دوارۆژیشدا، وە ئێستاش لەم سەدەی بیستو یەکەمەداو لەم چەند ساڵەدا دواییدا ئەو قەیرانە ئابوورییەی کە تووشی سیستەمی سەرمایەداریی بووە، لە ئەنجامی سوود خۆرییدا، چەمکی ئەم ئایەتە وەك ڕۆژ لە نێوەڕاستی ئاسمانێ بێ ئەوەی هەوری لێبێ، ئاوا دەدرەوشێتەوەو، وڵاتە سوود خۆرەکان هاوسەنگییان تێکچووە. کەواتە: لە دنیاداو لە دوارۆژدا سوود خۆران وەزعیان وەك هی شێتی لێدێ. ﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَالُوٓاْ إِنَّمَا ٱلْبَيْعُ مِثْلُ ٱلرِّبَوٰاْ﴾، بۆیە ئەو سزایەیان دەدرێ، وە بۆیە تووشی ئەو سەرەنجامە دێن چونکە گوتیان: کڕین و فرۆشتن وەك ڕیبا وایە، جا خۆی لە ئەسڵدا عیبارەتەکە دەبێ ئاوابێ: ڕیبا وەك کڕین و فرۆشتنێ وایە، بەڵام وەك بڵێی ئەوانە مەسەلەی ڕیباو سوود خۆرییان هێندە لەلا ئاسایی بووە، گوتوویانە: کڕین و فرۆشتنی ئاسایی وەك سوود خۆریی وایە، لەجیاتی ئەوەی بڵێن سوود خۆریی، وەك کڕین و فرۆشتن وایە ﴿وَأَحَلَّ ٱللَّهُ ٱلْبَيْعَ وَحَرَّمَ ٱلرِّبَوٰاْ﴾، لەحاڵێکدا کە خوا کڕین و فرۆشتنی ئاسایی حەڵاڵ کردوەو سوود خۆریی قەدەغە کردوە، جا دەگونجێ ئەمە قسەی ئەوان بێت، گوتوویانە: کڕین و فرۆشتن وەك سوود خۆریی وایە، کەچی خوا کڕین و فرۆشتنی حەڵاڵ کردوەو سوود خۆریی قەدەغە کردوە، وەك بڵێی ڕەخنە دەگرن کە خوا یەکیانی حەڵاڵ کردوەو یەکیانی قەدەغە کردوە، دەشگونجێ ئەوە قسەی خوای پەروەردگاربێ و قسەی وان لێرە کۆتایی بێ، کە دەڵێن: ﴿إِنَّمَا ٱلْبَيْعُ مِثْلُ ٱلرِّبَوٰاْ﴾، ئنجا خوا بۆخۆی دەفەرموێ: ﴿وَأَحَلَّ ٱللَّهُ ٱلْبَيْعَ وَحَرَّمَ ٱلرِّبَوٰاْ﴾، خوا کڕین و فرۆشتنی حەڵاڵ کردوەو سوود خۆریی قەدەغە کردوە، کەواتە: چۆن وەك یەکن ؟! دیارە خوای کاربەجێ هیچ شتێکیش قەدەغە ناکات مەگەر زیانبەخش بێ، هەر وەك هیچ شتێك حەڵاڵ ناکات، مەگەر سوودبەخش و چاك بێ و سەرەنجامی باشبێ ﴿فَمَن جَآءَهُۥ مَوْعِظَةٌ مِّن رَّبِّهِۦ فَٱنتَهَىٰ فَلَهُۥ مَا سَلَفَ وَأَمْرُهُۥٓ إِلَى ٱللَّهِ﴾، جا

هەرکەسێك ئامۆژگاریی لە پەروەردگارییەوە بۆبێ‌و دەست هەڵبگرێ، ئەوەی ڕابردوە بۆی حیساب دەکرێ‌و لەسەری حیساب ناکرێ، واتە: خوا سزای نادا لەسەر ئەوەی تێپەڕیوە، کە پێش قەدەغەکرانی سوود، ئەگەر شتێکی لە خەڵك وەرگرتبێ بە ڕیبا لەسەری حیساب ناکرێ، چونکە خوا پێشتر قەدەغەی نەکردوە، سەرەنجامیشی بۆ لای خوا دەگەڕێتەوە ﴿ وَمَنْ عَادَ فَأُوْلَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِۖ هُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴾، بەڵام دوای قەدەغەکرانی ڕیبا هەرکەسێك بگەڕێتەوە سەر سوود خۆریی، ئەوانە هاوەڵی ئاگرن، بە هەمیشەیی تێیدا دەمێننەوە، لە حاڵێکدا کە بە حەڵاڵی بزانن، یاخود سزای سوود خۆریی بەو شێوەیەیە، لە حاڵێکدا کە مرۆڤ ئیمانی نەبێ، ئەگەر ئیمانی هەبێ‌و بە حەڵاڵیشی نەزانێ، بەڵام بیکات، ئەوکاتە دەبێ بڵێین: ﴿ هُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴾، بە هەمیشەیی تێیدا دەمێننەوە، مەبەست پێی مانەوەیەکی زۆرە، نەك هەرگیز لێی نەیەنە دەرێ، بەڵکو زۆر لەوێدا دەمێننەوەو سزا دەدرێن، پاشان دەفەرموێ: ﴿ يَمْحَقُ ٱللَّهُ ٱلرِّبَوٰاْ وَيُرْبِي ٱلصَّدَقَٰتِ ﴾، خوا سوود لەبەین دەبات، وە خێرو چاکەکان گەشە پێ دەدات، ئەوە ئێستا وەك واقیع زۆر جوان دیارە، دەبینین سیستەمی سەرمایەداریی چۆن هەرەسی هێناو چەندان کۆمپانیاو کارگەی گەورە گەورە تووشی ئیفلاس‌و داخران بوون‌و کرێکارەکانیان ئیزن دایەوە، بەڵام ئەو بانقە ئیسلامییانەی کە لە وڵاتانی ئیسلامییداو تەنانەت لە وڵاتانی ڕۆژئاواشدا هەن، تووشی هیچ کێشەیەك نەبوون، چونکە مامەڵەیان بە بەسوود نەکردوە ﴿ وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ كُلَّ كَفَّارٍ أَثِيمٍ ﴾، وە خوا هیچ سپڵەیەکی گوناهباری خۆشناوێ، هەر کەسێك کە کوفرانی نیعمەتی خوا دەکات‌و سپڵە دەبێ بەرانبەر بە نیعمەتەکانی خوا، زۆر گوناهبارەو خوا خۆشی ناوێ.

ئنجا باسی ئیماندارانی کردەوە باشی نوێژکەرو زەکاتدەر دەکات‌و دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَأَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَوُاْ ٱلزَّكَوٰةَ لَهُمْ أَجْرُهُمْ عِندَ رَبِّهِمْ وَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴾، بێگومان ئەوانەی بڕوایان هێناوەو

کردەوە چاکەکان ئەنجام دەدەن، وە نوێژ بەرپا دەکەن و زەکات دەدەن، پاداشتیان لای پەروەردگاریانە، وە ترسیان لەسەرنیەو خەمباریش نابن، بۆ داهاتوو ترسیان لەسەرنیە، ئەوەی پەرێزی پاکە بێ باکە، وە بۆ ڕابردووش خەمبار نابن، چونکە شتێکیان نەکردوە کە خەمی بۆ داگرن، ژیانەکەیان بە پاکیی هێناوەو کە ئاوڕدەدەنەوە لە ڕابردوو چاکەی خۆیان بەبیر دێتەوە، دڵخۆش دەبن، بە پێچەوانەی کەسێك کە ئاوڕدەداتەوە لە ڕابردوو، تەماشا دەکات ئیشی چاکی نەکردوە، خەمبار دەبێ، وە کاتێ تەماشای داهاتوو دەکات، دیسان دەترسێ چونکە دەڵێ: من پەرێزم پیسە بۆیە کە لە داهاتوو دەڕوانێ و دەزانێ سزاو حیساب و کیتابی خوای دێتە پێشێ و لێپرسینەوەی دێتە پێشێ، دەترسێ، بەڵام ئەوەی پاکە بێ باکە، وە ئەوەی پەرێزی پاکە بەرچاوی ڕووناکە.

ئنجا دووبارە دێتەوە سەرباسی سوودخۆریی و دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَذَرُواْ مَا بَقِيَ مِنَ ٱلرِّبَوٰٓاْ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ ﴾، ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە ! پارێز لە خوا بکەن و ئەو سوودەی ماوە دەستی لێ هەڵبگرن، ئەگەر بڕوادارن، واتە: ئەو سوودەی کە ماوتانە لەسەر خەڵك لە بەرانبەر قەرزێکدا کە پێتانداون، بۆ خۆتان دەزانن کە ڕیبا بریتیە لەوەی کە کەسێك قەرز بە کەسێك دەداو مانگانە یاخود ساڵانە سوودی لێوەردەگرێ و، ئەو سوودو زیادەیە هیچ قەرەبوویەکی لە بەرانبەردا نیە، جا خوا دەفەرموێ: ئەوەی کە ماوتانە دەستی لێ هەڵبگرن، واتە: ئەوەی وەختی خۆی وەرتانگرتوە، لەمڕۆ بەدواوە خەتێك کێشرا، کە ئەوەی لەسەر لە خەڵکتانە لە بەرانبەری قەرزێکدا کە پێتان داون، زیادەکەی وەرمەگرن و دەستی لێ هەڵگرن.

ئەگەر تەماشا بکەن خوا ﷻ لە مەسەلەی قەدەغەکردنی ڕیبادا زۆر بە سەختیی هەڕەشەی کردوەو کە کەم شتی دیکەی حەرام هێندە هەڕەشەی لێکراوە، هەم هەڕەشەی دنیا، هەم هی دواڕۆژ، جا ئێمە کە ئێستا تەماشای وەزعی ئابووریی و کۆمەڵایەتیی دنیا دەکەین لە سایەی سیستەمی سەرمایەداریی و سیستەمی سوود

خۆرییدا، کە خەڵك تووشی چ فەوزاو گێژاوێك بووە، ئنجا بۆمان دەردەکەوێ حیکمەتی ئەوە چییە؟ پاشان دەفەرموێ: ﴿ فَإِن لَّمْ تَفْعَلُوا۟ فَأْذَنُوا۟ بِحَرْبٍ مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ﴾، جا ئەگەر وانەکەن‌و دەست هەڵنەگرن لەو ڕیبایەی کە ماوەتەوە لەسەر خەڵك، ئەوە ئاگادارکرانەوە بە جەنگێك لەلایەنی خواو پێغەمبەری خواوە ﷺ، واتە: ئەگەر دەست هەڵبگرن لە ڕیبا ئەوەی ڕابردووتان لێ خۆش دەبێ، بەڵام ئەگەر هەر سوودەکەتان داوابکەن، وەك لە هۆی هاتنە خوارەوەکەش بۆمان دیارە، ئەوە ئێوە لە حاڵەتی جەنگدان لەگەڵ خوای پەروەردگارو لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ واتە: لەگەڵ دەستەڵاتی سیاسی ئیسلامییدا ﴿ وَإِن تُبْتُمْ فَلَكُمْ رُءُوسُ أَمْوَٰلِكُمْ ﴾، بەڵام ئەگەر تۆبە بکەن‌و پەشێمان ببنەوە، ئەوە سەرمایەکانتان بۆخۆتان ﴿ لَا تَظْلِمُونَ وَلَا تُظْلَمُونَ ﴾، نە زوڵم دەکەن نە زوڵمیشتان لێ دەکرێ، زوڵم لە خەڵکی ناکەن زیادەیان لێ وەربگرن‌و زوڵمیشتان لێ ناکرێ دەستمایەکانیشتان بفەوتێ، چونکە کەسێك هەر ئەسڵی پارەکەشی بفەوتێ، ئەوە زوڵمی لێ کراوە، ئەو زیادەیەش کە وەریدەگرێ زوڵم دەکات، جا خوا ﷻ دەیەوێ ئێمەی مسوڵمان نە زاڵم بین نە مەزڵووم، جا دیارە ئەم ڕستە قورئانییە دەربارەی مەسەلەی ڕیباو سوود خۆریی هاتۆتە خوار، بەڵام واتاو چەمکەکەی گشتییەو وەك بنچینەیەك ئیسلام دەڵێ: ﴿ لَا تَظْلِمُونَ وَلَا تُظْلَمُونَ ﴾، واتە: نە زوڵم بکەن لە هیچ ڕوویەکەوە، نە قەبووڵی زوڵمیش بکەن، واتە: ئیسلام هەر ناڵێ زوڵم مەکە، بەڵکو دەڵێ مەهێڵە زوڵمیشت لێ بکرێ، ئیسلام پێی خۆشە مسوڵمان دەست درێژنەکات بۆ ماڵ‌و سامان‌و نەفس‌و نامووسی خەڵك، بەڵام بەهەمان شێوە دەڵێ: وا بکەن خەڵکیش تەماع لە نەفس‌و ماڵ‌و نامووست نەکات ﴿ وَإِن كَانَ ذُو عُسْرَةٍ فَنَظِرَةٌ إِلَىٰ مَيْسَرَةٍ ﴾، وە ئەگەر بابای قەرزدار تەنگ دەست بوو، چاوەڕێی بکەن تاکو ئاسانی بۆ دێتە پێش‌و دەستکراوە دەبێ ﴿ وَأَن تَصَدَّقُوا۟

خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴾، خۆ ئەگەر بێت و خێریش بکەن و بە یەکجاریی لەو قەرزەشتان ببوورن و لێی خۆش بن، مادام ئیمکانیەتتان هەیەو کابراش نەدارەو هەژارە، ئەوە زۆر چاکترە بۆ ئێوە، ئەگەر بزانن، بەڵام لێرەدا خوا نەیفەرمووە واجبەو دەبێ لە قەرزەکەش خۆشبن، بەس بابای خاوەن قەرزی هانداوە، هەڵبەتە لێرەدا وەك پێشتریش باسم کرد ئەم ئایەتە هەرچەندە دەربارەی ئەوانەی قەرزیان بەخەڵك داوە لە بەرانبەر ئەوەدا کە سوودیان لێ وەردەگیرێ، هاتۆتە خوارێ، بەڵام بەگشتی هەموو خاوەن قەرزێك دەگرێتەوەو بابای خاوەن قەرز چ بە ڕیبا قەرزی دابێ، چ بە قەرزی باش (قَرض الحَسَنَةَ)و بەبێ بەرانبەر، هەرچۆن بێ، ئەگەر لە بابای قەرزدار خۆشبێ، ئەوە هەر خێرو چاکەیە، دواییش زیاتر باسی ئەو مەسەلەیە دەکەین.

ئنجا خوای بە بەزەیی و باڵادەست ڕوو لە بڕواداران دەکات و قیامەتیان دەخاتەوە بیرو دەفەرموێ: ﴿ وَٱتَّقُواْ يَوْمًا تُرْجَعُونَ فِيهِ إِلَى ٱللَّهِ ﴾، وە لە ڕۆژێك بترسن و پارێز لە ڕۆژێکی بکەن کە تێیدا دەگێڕرێنەوە بۆ لای خوا، واتە: ئەم دنیایە هەر ئاوا نابێ و ڕۆژێك دێ دەچنەوە بۆ لای خوا ﷻ، ئنجا حیساب بۆ ئەو ڕۆژە بکەن و خۆتان بۆ ئەو ڕۆژە ئامادە بکەن، کەچی تێدا دەقەومێ ؟ ﴿ ثُمَّ تُوَفَّىٰ كُلُّ نَفْسٍ مَّا كَسَبَتْ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴾، ئنجا هەر نەفسێك چی کردوە بەتەواویی بەرانبەرەکەی وەردەگرێتەوە، ئەگەر سزایە ئەگەر پاداشتە ﴿ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴾، وە ستەمیشتان لێ ناکرێ، هیچ کەس نە تۆزێك لە چاکەکانی بەزایە دەدرێ، کە پاداشتی نەدرێتەوە، نە زەڕڕەیەك لە خراپەی دەخرێتە سەرشان کە نەیکردبێ، خوای پەروەردگار لەو کەسانەمان بگێڕێ کە لە هەموو جۆرو شێوەکانی سوود خۆریی خۆ دەپارێزن، وە لەو کەسانەمان بگێڕێ، کە ئەگەر هەقێکمان لە لای هەرکەسێك بوو بە سەماحەت و چاوپۆشییەوە لەگەڵیدا مامەڵە دەکەن، وە خوا بە لوتف و کەرەمی خۆی وامان لێبکات خۆمان بڕازێنینەوە بە هەموو ئەو سیفەت و ئەدەبە بەرزانەی کە مسوڵمانانیان بۆ هانددا.

## چەند مەسەلەیەکی گرنگ

**مەسەلەی یەکەم:** ڕیبا چییە؟ بە کوردی ئێمە بە ڕیبا دەڵێین: سوود، وە سوود خۆریی واتە: بەکارهێنانی ڕیباو وەرگرتنی ڕیبا، وە زانایان بە چەند شێوەیەك پێناسەی (ڕیبا)یان کردوە، کە هەموویان لە نێوەڕۆکدا دەبنەوە بەیەك، هەندێکیان گوتوویانە: (الرِّبا: هُوَ فَضْلُ مالٍ خَالٍ عَنِ العِوَضِ في معاوَضَةِ مالٍ بِمالٍ) واتە: زێدەی ماڵێکە کە هیچ قەرەبوویەکی لە بەرانبەردا نیە، لە گۆڕینەوەی ماڵێك بە ماڵێك، واتە: کابرا سەد دینار دەدا بە کەسێك دەڵێ: کاکە تۆش دوای دوو مانگی دیکە سەد دینارەکەم بدەوە، بەڵام دە دیناریشی زیادە لەگەڵ دابێ، ئەوە ڕیبایە، جا ئەو زێدەیە دەڵێ، پەنجابێ، یەك بێ، کەم بێ، یان زۆر بێ، هەر ماڵێك زیادەی بخرێتە سەر بە قەرز بۆ کاتێکی دیاریکراو، کەم بێ یا زۆر بێ، پێی دەگوترێ: سوود زانایان لەوبارەوە گوتوویانە: (كُلُّ قَرْضٍ جَرَّ نَفعاً فَهُوَ رِباً)، واتە: هەر قەرزێك سوودێك ڕابکێشێ ئەوە ڕیبایە.

**مەسەلەی دووەم:** جۆرەکانی ڕیبا:

**یەکەم:** (رِبا النَّسيئة) واتە: ڕیبای قەرز.

دووەم: (رِبا الفَضل) واتە: ڕیبای زێدە.

١- (رِبا النَّسيئة): واتە: ڕیبای قەرز، بەم شێوەیە پێناسە کراوە: (هُوَ أَخذُ مِقْدارٍ مُحَدّدٍ مِنَ المالِ شَهْرِياً مقابِل دَيْنٍ)، واتە: بریتییە لە وەرگرتنی ئەندازەیەکی دیاریکراو لە پارە بە شێوەی مانگانە {بەڵکو ئەگەر مانگانەش نەبێ کەمتر، یان زیاتریش بێ لە مانگانە} لە بەرانبەر قەرزێکدا.

هەرکەسێك قەرزێکی دا بە کەسێك لە بەرانبەریدا چەند کاتێکی دیاریکراو زیادە وەربگرێ، وە ئەسڵی پارەکەش کە پێی دراوە، هەر لەجێی خۆی بێ، ئەوە (رِبا النَّسيئة)یە واتە: ڕیبای قەرز.

٢- (رِبا الفَضل) ڕیبای زێدە، بەم شێوەیە پێناسەکراوە: (هُوَ بَيعُ ما يَجري فيهِ الرِّبا بِجِنسِهِ مُتَفاضِلا)، واتە: بریتییە لە فرۆشتنی شتێك بە جینسی خۆی بە ئەندازەیەك زیادە. وەك گەنم بە گەنمو زیادەی لەگەڵدابێ، تری بە تریێو زیادەی لەگەڵدابێ، وە هەروەها، پێغەمبەر ﷺ دەربارەی جۆری دووەمی ڕیبا (ربا الفضل) فەرموویەتی: {(الذَّهَبُ بِالذَّهَبِ، وَالْفِضَّةُ بِالْفِضَّةِ، وَالْبُرُّ بِالْبُرِّ، وَالشَّعِيرُ بِالشَّعِيرِ، وَالتَّمْرُ بِالتَّمْرِ، وَالْمِلْحُ بِالْمِلْحِ، مِثْلاً بِمِثْلٍ سَوَاءً بِسَوَاءٍ يَدًا بِيَدٍ، فَإِذَا اخْتَلَفَتْ هَذِهِ الأَصْنَافُ فَبِيعُوا كَيْفَ شِئْتُمْ إِذَا كَانَ يَدًا بِيَدٍ) (رَوَاهُ مسلم برقم: (٤٠٣٩)، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدرِيّ وعُبَادَةَ بْنَ الصَّامِتِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا}، واتە: زێڕ بە زێڕ، وە زیو بە زیو، وە گەنم بە گەنم، وە جۆ بە جۆ، وە خورما بە خورما، وە خوێ بە خوێ، ئەگەر ئەندازەکان وەك یەك بن، یەکسەرو دەست بە دەست بێ {ئەوە حەڵاڵە، بەڵام ئەگەر ئەندازەی یەکێکیان زیاتربێ، ئەوە ڕیبایە}، بەڵام ئەگەر جۆرەکانی جیاوازبوون مادام دەست بە دەست بێ، ئەوە چۆنتان حەز لێیە مامەڵە بکەن، ئەو کاتە حوکمەکەی دەگۆڕێ، وەك دەفەرموێ: {فَإِذَا اخْتَلَفَتْ هَذِهِ الأَصْنَافُ فَبِيعُوا كَيْفَ شِئْتُمْ إِذَا كَانَ يَدًا بِيَدٍ}، ئەگەر ئەم جۆرانە جیاواز بوون {گەنم بە جۆ زێڕ بە زیو، خورما بە خوێ، وە هەروەها مادام جۆرەکانیان جیابوو} ئەوە چۆنی دەفرۆشن بفرۆشن زیادەی دەبێ چۆن دەبێ، مادام دەست بە دەست بێو لە یەك کاتدابێ.

**مەسەلەی سێیەم:** خوا ﷻ لێرە کە باسی ڕیبای کردوە، باسی خواردنی ڕیبای کردوە، دەفەرموێ: ﴿ٱلَّذِينَ يَأۡكُلُونَ ٱلرِّبَوٰاْ﴾، ئەوانەی سوود دەخۆن، بەڵام خۆ مەرج نیە ئەوەی بە ڕیبا وەردەگیرێ، هەمووی هەر بخورێ، جاری وایە دەکرێتە بەرگو پۆشاك، یان دەکرێتە خانووبەرە، یان دەکرێتە کەلوپەلی بازرگانی، وەك سەیارەو ... هتد، زانایان دەڵێن: ئەوە تەعبیرە لەبەر ئەوەیە کە خواردن ئامانجی سەرەکییە لە پەیداکردنی پارەو سامان، واتە: ئامانجی سەرەکیی بۆ پارەو سامان بریتییە لە بەکارهێنانی بۆ خواردنو خواردنەوە،

ئەگەرنا مەسەلە ئەوە نیە یەکێك بڵێ: پارەکەم بە سوود پەیداکردوە، بەلاّم ئەگەر نەیخۆم قەیدی ناکات ! بۆیەش ئەوە دەڵێم چونکە مسوڵمانی وا سادە هەیە گوتوویەتی: ئەوە ڕیبایە وایە، بەلاّم من چوومە حەمامو ئاودەستم پێ دروست کردوە، خۆ نەمخواردوە !! نا، لەڕاستیدا هەر جۆرە بەکارهێنانێکی ماڵی حەرام هەر حەرامە، ئەگەر خانووی پێ دروست بکەی بچیە سێبەری، ئەگەر بەرگێکی پێ دروست بکەی‌و لەبەری بکەی، ئەگەر حەمامی پێ دروست بکەی‌و خۆتی تێدا بشۆی، هەموو جۆرە بەکارهێنانێکی حەرام هەر حەرامە، کەواتە: مسوڵمان نابێ سادەو سەرکێل بێ‌و، ئایەتەکان بە سادەیی‌و سەرکێڵیی فام بکات ! بەڵکو دەبێ لە ئامانجی ئایەتەکان حاڵی بین‌و لە نێوەڕۆکیان تێبگەین‌و بزانین خوای بێ هاوەڵ لەم ئایەتەدا بۆچی وای فەرموە ؟

**مەسەلەی چوارەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ ٱلَّذِينَ يَأْكُلُونَ ٱلرِّبَوٰاْ لَا يَقُومُونَ إِلَّا كَمَا يَقُومُ ٱلَّذِى يَتَخَبَّطُهُ ٱلشَّيْطَٰنُ مِنَ ٱلْمَسِّ ﴾، ئەوانەی ڕیبا دەخۆن {واتە: ئەو ماڵە زیادەی کە لە بەرانبەری قەرزێك وەریدەگرن، دەیخۆن} هەڵناستن مەگەر وەك هەڵسانی ئەو کەسەی کە شەیتان دەستی لێوەشاندوە کە بە نارێکیی بەملاولادا دەکەوێ، چونکە (تَخَبُّط) ئەوەیە کە کابرا بەملاولادا بکەوێ‌و بە شێوەیەکی نارێك‌و بە لۆژە لۆژە بڕوات، پێشتر باسمکرد کە توێژەرەوانی قورئان هەندێکیان گوتوویانە: ئەو هەڵسانە مەبەست پێی هەڵسانی ژیانی دنیایەو، هەندێکیان گوتوویانە: نەخێر مەبەست پێی دواڕۆژە، بەلاّم بەڕاستی دەتوانین بڵێین: مەبەست دنیاشەو دواڕۆژیشە، لە دنیاشدا کۆمەڵگایەك سوود خۆریی تێدا هەبێ، ژیانیان تێکدەچێ‌و وەك ژیانی شێتانی لێدێ، وە لە دواڕۆژیشدا خوای پەروەردگار بە جۆرێك سزایان دەدا، وەك شێت‌و حۆلیان لێ دێ.

**مەسەلەی پێنجەم:** کە لێرەدا خوا ﷻ وێنە دێنێتەوە بۆ بابای سوود خۆر بە کەسێك کە شەیتان دەستی لێوەشاندوە، لێرەدا یەکێ بۆی هەیە بپرسێ: ئایا دەگونجێ شەیتان دەست لە ئینسان بوەشێنێ‌و وای لێ بکات کە شێت بێ‌و عەقڵی تێکبچێ، وە ئایا دەگونجێ شەیتان بچێتە نێو جەستەی

ئینسانەوە ؟! لەوەڵامدا دەڵێین: لەوبارەوە زانایان بوونەتە دوو بەش هەر لە دێر زەمانەوە:

١- هەندێکیان گوتوویانە: هەموو ئەوەی کە شەیتان دەتوانێ لەگەڵ ئینساندا بیکات، ئەوەیە کە وەسوەسەو خوتخوتەی خراپی بخاتە دڵ، لەوە بەولاوە شەیتان هیچ دەستەڵاتێکی بەسەر ئینساندا نیە، لەوبارەشەوە چەند شتێك بە بەڵگە دێننەوە، بۆ نموونە:

**بەڵگەی یەکەم:** خوا ﷻ فەرمانی بە ئێمە کردوە کە پەنا بگرین بە خوا لە وەسوەسەی شەیتان. وەك فەرموویەتی: بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ النَّاسِ ﴿١﴾ مَلِكِ النَّاسِ ﴿٢﴾ إِلَٰهِ النَّاسِ ﴿٣﴾ مِن شَرِّ الْوَسْوَاسِ الْخَنَّاسِ ﴿٤﴾ الَّذِي يُوَسْوِسُ فِي صُدُورِ النَّاسِ ﴿٥﴾ مِنَ الْجِنَّةِ وَالنَّاسِ ﴿٦﴾﴾ الناس، واتە: بەناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە، بڵێ پەنا دەگرم بە پەروەردگاری خەڵك ﴿١﴾ پادشای خەڵك ﴿٢﴾ پەرستراوی خەڵك ﴿٣﴾ لە خراپەی وەسوەسەکەری خۆپەنهانکەر ﴿٤﴾ ئەوەی کە خوتخوتە دەخاتە سینەی خەڵکەوە ﴿٥﴾ لە جند بێ یاخود لە ئادەمیزاد ﴿٦﴾.

**بەڵگەی دووەم:** وە ئەم ئایەتەش بەبەڵگە دێننەوە کە خوا ﷻ لە سووڕەتی (الصافات)دا باسی زەققوم دەکات و دەفەرموێ: ﴿أَذَٰلِكَ خَيْرٌ نُّزُلًا أَمْ شَجَرَةُ الزَّقُّومِ ﴿٦٢﴾﴾ دەفەرموێ: ﴿طَلْعُهَا كَأَنَّهُ رُءُوسُ الشَّيَاطِينِ ﴿٦٥﴾﴾ الصافات، (طَلْعُهَا) واتە: (ثَمَرُهَا) ﴿كَأَنَّهُ رُءُوسُ الشَّيَاطِينِ﴾، واتە: درەختی (زَقوم) میوەکەی وەك سەری شەیتانان وایە، جا ئەو زانایانە دەڵێن: کێ سەری شەیتانانی دیوە ؟ بێگومان کەس سەروگوێلاکی شەیتانی نەبینیوە، هەتا بزانێ چۆن میوەی درەختی زەققوم وەك سەری شەیتانان دەچێ، دەڵێن: کەس سەری شەیتانی نەبینیوە ئەدی بۆچی خوا ﷻ وا دەفەرموێ؟! دەڵێن: لەبەر ئەوەی لە خەیاڵی خەڵکدا ئەوە هەموو کەس دەزانێ، کە شەیتان

مەخلووقێكی دزێوو ناشیرینە، چونكە هیچ ئیشی چاك ناكاتو خراپە نەبێ نایكات، لەبەر ئەوە هەموو كەس دەزانێ سەرو گوێلاكو بیچمێكی ناشیرینی هەیە، ئنجا كە لە خەیاڵی ئێمەدا ئاوایە، خوای كاربەجێ بەپێی خەیاڵی ئێمە دەفەرموێ: میوەی درەختی زەققوم وەك سەرو بیچمی شەیتان ناشیرینە، مەبەستیان ئەوەیە كەواتە: دەشگونجێ لێرەدا خوای پەروەردگار بەپێی عەقڵی ئێمە دوابێ كە كەسێك شێت دەبێ دەڵێین: شەیتان دەستی لێوەشاندوە، ئەویش بەپێی تێگەیشتنی ئێمە لێرەدا قسەی كردوەو دەفەرموێ: بابای سوود خۆر وەك بابای دەست لێوەشێنراو وایە وەك چۆن میوەی زەققوم وەك سەری شەیتانی وایە، قسەكەشیان وێ دەچێ.

٢- هەندێكی دیكە لە زانایان كە زۆرینەن، وە مـن خۆشم هەر ڕام وەك هی دووەمە، هەرچەندە ئەو جۆرە بەڵگە هێنانەوەی زانایانی ڕای یەكەمیش بە هێزە، بەڵام دەتوانین بڵێین: ئێمە بەڵگەی دیكەمان هەیە لەسەر ئەوە كە شەیتان دەست لە ئینسان دەوەشێنێو، دەتوانێ ئینسان شێت بكاتو دەتوانێ بچێتە نێو جەستەی ئینسانەوە، كە هەتا ئەم لەحزەیە من قەناعەتم وایە، ئەمەش چەند بەڵگەیەك لەسەر ئەم ڕایەی دووەم:

**بەڵگەی یەكەم:** ئەوەیە كە خوای زاڵ وتوانا لە سووڕەتی (الأنعام)دا دەفەرموێ: ﴿ قُلۡ أَنَدۡعُواْ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَنفَعُنَا وَلَا يَضُرُّنَا وَنُرَدُّ عَلَىٰٓ أَعۡقَابِنَا بَعۡدَ إِذۡ هَدَىٰنَا ٱللَّهُ كَٱلَّذِي ٱسۡتَهۡوَتۡهُ ٱلشَّيَٰطِينُ فِي ٱلۡأَرۡضِ حَيۡرَانَ لَهُۥٓ أَصۡحَٰبٞ يَدۡعُونَهُۥٓ إِلَى ٱلۡهُدَى ٱئۡتِنَاۗ ...﴿٧١﴾ ﴾ الأنعام، واتە: (ئەی پێغەمبەر ! ﷺ) بفەرموو: ئایا جگە لە خوا هاواری كەسێكی دیكە بكەین، كە نەسوودمان پێ دەگەیەنێ نە زیانمان لێ دەدا، وە پاشەو پاش بكشێینەوەو بگەڕێینەوە بۆ دواوە، دوای ئەوەی كە خوا ڕێنمایی كردووین ؟ وەك كەسێك كە شەیتانەكان بردوویانە بەرەو سەر زەمینێكی چۆڵ، سەراسیمە بووە، هەندێ لە هاوەڵانی هەن بانگی دەكەن دەڵێن: وەرەوە بۆ لای ئێمە! ئەویش لەوێ سەرگەردان بووە ! لێرەدا ئەم ئایەتە زۆر ڕوونە كە: دەگونجێ شەیتانەكان ئینسانەكان

بانگ بکەن، وە بیانبەن بۆ دەشتی چۆڵو هەڵیاخەڵەتێنن و سەرگەردانیان بکەنو سەراسیمەیان بکەن، چونکە خوای زاناو توانا شتێك کەوا نەبێ نایهێنێتەوە، لێرەدا مەسەلە ئەوە نیە داخۆ لە زەینی ئێمەدا چۆنە ؟ خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ئەوانەی کە غەیری خوا دەپەرستن و لە غەیری خوا دەپارێنەوە، وەك ئەو کەسە وایە کە شەیتانەکان دەیبەن بۆ دەشتو بیابانێكو بە سەرگەردانیی سەراسیمەیی لەوێ بۆخۆی دەخولێتەوەو هەرچەند خەڵك بانگی دەکات، بەڵام ئەو سەرگەردان بووەو بەدوای شەیتانەکان کەوتوەو ئەوان هەڵیانخەڵەتاندوەو بردوویانە !

**بەڵگەی دووەم:** ئەو فەرمایشتەی پێغەمبەرە ﷺ کە فەرموویەتی: {(إِنَّ الشَّيْطَانَ يَجْرِي مِنِ ابْنِ آدَمَ مَجْرَى الدَّمِ) (رَوَاهُ الْبُخَارِيُّ برقم: (٧١٧١)، عَنْ عَلِيِّ بْنِ حُسَيْنٍ رضي الله عنه)، واتە: شەیتان لە ئادەمیزادا دێتو دەچێ بەو شوێنەدا کە خوێنی پێدا دێتو دەچێ، یانی: خوێن چۆن بە چ ڕەگو دەزوولەکانی خوێندا دێو دەچێ، واتە: هەر شوێنێك خوێن پێیدا بێتو بچێ بە جەستەی ئینساندا، شەیتانیش بەو دەمارو دەزوولانەدا دەتوانێ هاموشۆ بکات، ئەوەش زۆر ڕوونە، کەواتە: شەیتان دەتوانێ بچێتە جەستەی ئینسانەوەو، هەر شوێنێك خوێنی پێدا بچێ، شەیتانیش دەتوانێ پێیدا بچێ.

**بەڵگەی سێیەم:** ئەم فەرمایشتەیە: {(عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنه، أَنَّ امْرَأَةً جَاءَتْ بِابْنٍ لَهَا إِلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللهِ إِنَّ ابْنِي بِهِ جُنُونٌ، وَإِنَّهُ يَأْخُذُهُ عِنْدَ غَدَائِنَا وَعَشَائِنَا، فَيُخَبِّثُ عَلَيْنَا، فَمَسَحَ رَسُولُ اللهِ ﷺ صَدْرَهُ وَدَعَا، فَثَعَّ ثَعَّةً، وَخَرَجَ مِنْ جَوْفِهِ مِثْلُ الْجَرْوِ الأَسْوَدِ يَسْعَى) (رَوَاهُ الدَّارَمِي برقم: (١٩)، بِسَنَدٍ حَسَنٍ، وَأَخْرَجَهُ الطَّبَرَانِي فِي (الكَبِير) برقم: (١٢٤٦٠) عَنْ جَابِرِ بنِ عَبدِاللهِ رضي الله عنه}، واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس خوا لە خۆیو باوکی ڕازی بێ دەڵێ: ئافرەتێك کوڕێکی خۆی هێنا بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەم کوڕەی من شێتە، وە لەکاتی نان خواردنی نیوەڕۆمانو نان خواردنی ئێوارەماندا شێتی دەیگرێو

خواردنەکەمان لێ پیس دەکاتو لێمان تێکدەدات، پێغەمبەریش ﷺ دەستی بە سینگی داهێناو دووعای کرد ئەویش قرپێکی هاتێ {وەك بڵێی ڕشایەوە}و شتێکی لە هەناو هاتە دەرێ وەك تولە سەگی ڕەش وابووو ڕۆیشت، دیارە ئەو شەیتانە کە لە جەستەیدا بووە (تَجَسُّم)ی کردوە، ئەگەرنا شەیتان لەسەر شێوەی خۆی نابینرێ، بەڵام لەو کاتەدا وەك عیبرەت، بۆ ئەوەی بزانرێ کە ئەوە شەیتان بووە، بەرجەستەوە بووەو چۆتە قاڵبێکی ماددییەوە، لە شێوەی تولە سەگێکی ڕەشداو ڕۆیشتوە.

ئنجا من زیاد لەوەش دەڵێم: ئەو شتانەی کە بە ئەزموونو عەقڵ دیاربن، پێویستییان بە بەڵگەی شەرعییش ناکات، دیارە ئێمە ناڵێین هەر کەسێك نەخۆش بوو سەری ئێشا (جند)ی تێدایە، وەك هەندێ کەس بەڕاستی زۆر زێدەڕۆیی لەم مەسەلەیەدا دەکەن، جاری وایە خەلەلێکی ئەندامییە، جاری وایە خەلەلێکی دەروونییە، وە جاری وایە خەلەلێکی دەماغییە، ناڵێین هەرچی سەری ئێشاو هەرچی شێت بوو، حەتمەن ئەوە جندی لە بەدەن دایەو شەیتان دەستی لێوەشاندوە!! ئەوە ڕاست نیە، بەڵام بەڕاستی بە ئەزموون دەرکەوتوە کە جاری واش هەیە هۆکاری ئەو جۆرە تێکچوونە شەیتانە، من بۆخۆم نەفەر هاتوە بۆ لامان بە زنجیر دەستو پێیان بەستوە، هەرچەندە: من بۆخۆم ئەو چارەسەرە ناکەمو مەجالم نیە، بەڵام کابرا دەستو پێیان بەستبوو بردبوووشیان بۆ لای کەسێك کە بە حیساب جند دەردەکات، هێندەی لە بنە پێیان دابوو بنە پێی بریندار بوو بوون، بە گۆجە گۆج دەڕۆییو حاڵەتێکی زۆر خراپی هەبوو، دوایی من هەندێك قورئانم بۆ لە ئاو خوێندو سوورەتی فاتیحەو هەندێ ئایەتی دیکە کە زانایان گوتوویانە: بۆ دەرچوونی شەیتان لە جەستەی ئینسان باشن، دیارە نەیدەهێشت ئاوەکە بە گەروویدا بکرێ، بەڵام هەرچۆن بوو گرتمانو ئاوەکەمان بە گەرووودا کرد، ئیدی کابرا یەکسەر هاتەوە سەر حاڵەتی ئاساییو گوتی: دەستو پێم بکەنەوە، دەستو پێمان کردەوەو بۆوە ئینسانێکی ئاسایی، کە پێشتریش بە شەش حەوت

کەسان هێنابوویان‌و بۆیان مەرزەم نەدەکرا، دیارە دەگونجێ وێنەی زۆر لەسەر لەوبارەوە بهێنرێنەوە[١]، کە ئەوە ناتوانین بڵێین ناتەواویی مێشکیی (الخلل الدماغي)یە، چونکە ناتەوایی مێشکیی بەو جۆرە چاك نابێ، یان بڵێین: خەلەلێکی دەروونییە، نەخێر تەصەووڕ ناکەم وابێ، بەهەر حاڵ مەبەستم ئەوەیە جگە لەم دەقانەی قورئان‌و سوننەت، بە ئەزموونیش دەرکەوتوە کە جاری وایە (جند) دەچێتە بەدەنی هەندێك کەسەوە، هەڵبەتە نەك هەموو کەس، بەڵکو شەیتانەکان زیاتر زەفەر بەو کەسانە دەبەن کە بێهێزن لەڕووی ئیمانییەوە، وە مرۆڤ لە حاڵەتی ترسدا دەچنە نێو بەدەنی‌و، لە حاڵەتی تووڕەبووونداو، لە حاڵەتی زۆر خەفەت خواردن‌و دڵتەنگییدا، لەو حاڵەتانەدا کە ئینسان بێهێزیی (ضُعف) ڕووی تێدەکات‌و کەلێن دەدۆزنەوە، دەچنە نێو بەدەنی، دیارە شتێك کە بە عەقڵ‌و بە ئەزموونیش بۆمان دەرکەوتبێ، پێویستی بەوە ناکات ئایەتی لەسەر بێنین‌و حەدیسی پێغەمبەری ﷺ لەسەر بێنینەوە، وەك ئەوە کە یەکێك بڵێ: بەڵگەت چییە لە قورئان‌و سوننەتدا کە (واشنتۆن) پایتەختی ئەمەریکایە؟ دەڵێین: ئەوە پێویستی بە قورئان‌و سوننەت ناکات‌و بۆخۆت دەتوانی هەر نەخشەیەکی سیاسیی بخوێنییەوە، یان بچی بۆ ئەوێ، یان ئایا بەڵگەت چییە کە (پەککین) پایتەختی (چین)ە؟ دەڵێین: پێویست بە بەڵگەی قورئان‌و سوننەت ناکات، چونکە ئەوە بە ئەزموون‌و بە چاوو بە عەقڵ دەتوانی ئەوە ببینی‌و دەرکی بکەی.

**مەسەلەی شەشەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَالُوٓا۟ إِنَّمَا ٱلْبَيْعُ مِثْلُ ٱلرِّبَوٰا۟ ۗ وَأَحَلَّ ٱللَّهُ ٱلْبَيْعَ وَحَرَّمَ ٱلرِّبَوٰا۟﴾، پێشتر باسمان کرد کە دەگونجێ ئەوە هەمووی قسەی سوود خۆرەکان بێ، واتە: لەبەر ئەوە ئەو سزایە دەدرێن کە گوتیان: کڕین‌و فرۆشتن وەك ڕیبا وایە، کەچی خوا کڕین‌و فرۆشتنی حەڵاڵ‌و ڕیبای حەرام کردوە ! کە وەك پێشتر گوتمان: ئەسڵەکەی ئەوەیە بگوترێ: ڕیبا وەك کڕین‌و

١) واتە: کە هەر خۆم بینیومن .

فرۆشتن وایـە، بەڵام خوای پەروەردگار ئەو تەعبیـرەی ئاوا هێناوە، یانی: ئەوانە هێندە ڕیباو سوود خۆریی بە شتێکی ئاسایی دەزانن، کە پێیان وایە ئەسڵ ڕیباو سوود خۆرییـەو، دەبێ کڕین و فرۆشـتنیش قیاس بکرێتـە سەر ئەو، نـەك بڵـێی ئەسڵ کڕین و فرۆشـتن بێ و ڕیبـاش لەگەڵ ئەو بخرێتـە تـەرازووەوە ! کە دیـارە ئەوکاتە مانای ئایەتەکەو چەمکی قسەکەیان ئـاوای لێ دێ: جا مـادام کـڕین و فرۆشـتن وەك ڕیبـا وابێ، ئـەدی یـانی چی خوا کڕین و فرۆشـتن حـەڵاڵ دەکـاو ڕیبـا حەرام دەکا ؟ وەك بڵێی ئەوە ڕەخنەگرتنە لە خـوا ﷻ !!

هەندێکیش لە توێژەرەوان دەڵێن: نـا، بـەڵکو ئـەوەی دووەمیـان قـسەی خـوای کاربەجێیـەو، خوا بەرپەرچی ئـەوان دەداتـەوەو، دەفـەرموێ: ﴿ وَأَحَلَّ ٱللَّهُ ٱلْبَيْعَ وَحَرَّمَ ٱلرِّبَوٰاْ ﴾، خـوا کـڕین و فرۆشـتنی حـەڵاڵ کـردوەو سـوود خـۆریی قەدەغـە کـردوە، کەچـی ئەوانیـش دەڵێـن: وەك یەکـن ! جـا لێـرەدا شـتێکمان دەسـت دەکـەوێ، ئـەویش ئەوەیـە کـە خـوا ﷻ پاساوی سـزا درانیـان بـەو سـزا سـەختە دەکات، کە وەك شێتیان لێدێ لە دنیا یان لە دواڕۆژ یان لە هەردووکیاندا، بەچی دەداتەوە عیللەتەکەی چییە؟ ﴿ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَالُوٓاْ إِنَّمَا ٱلْبَيْعُ مِثْلُ ٱلرِّبَوٰاْ ﴾، واتـە: ئەو سزایەیان لەبەر ئەوەیە کە ئاوایان گوت: یانی نـەك هەر ئـەو کەسانەی کە سوود خۆریی دەکەن بەکردەوە، بەڵکو ئەوەی کـەواش بڵێت، ئـەوە بـەو شێوەیە سزا دەدرێت! کەواتە: وای لەوەی وێـڕای ئـەو بڕوایـە خراپـە، بـەکردەوەش ڕیبـا دەخـوات و مامەڵەشی پێدەکات!!

**مەسەلـەی حەوتـەم:** کـە دەفـەرموێ: ﴿ فَمَن جَآءَهُۥ مَوْعِظَةٌ مِّن رَّبِّهِۦ فَٱنتَهَىٰ فَلَهُۥ مَا سَلَفَ ﴾، هەرکەسـێك ئامۆژگـاریی لـە پەروەردگـارییەوە بـۆی بـێ و دەسـت هەڵبگرێ، ئەوە هی ڕابردوو بۆخۆیـەتی، ئایا مەبەست پێی چییە؟ واتـە: ئـەو سوود خۆرییەی کە لە ڕابردوودا کردوویەتی و ئـەو زیـادە ماڵەی وەریگرتـوە لـە بەرانبەر قەرزدا، کە بە خەڵکی داوە، لەسـەری حیساب ناکرێ و بۆشی بە حەڵاڵ دادەنرێ، چونکە پێش قەدەغەکرانی وەریگرتوە، دیارە هەرچی خواش قەدەغەی

نەکات ڕەوایەو، دوای ئەوەی کە خوای پەروەردگار قەدەغەی دەکا، ئنجا حەرام دەبێ، ئەگەرنا پێشتر حەلاڵەو لێپرسینەوەی لەگەڵ ناکرێ لەسەر ئەوە، بەلام بێگومان ئەوە بۆ کاتی خۆیەتیو، دوای ئەوەی کە خوای زاڵو کاربەجێ حوکمە شەرعییەکانی ناردوونە خوارێ، مسوڵمانان دەبێ پێیانەوە پابەندبن، نەك مسوڵمانێکیش بڵێ: ئەوە ئایەتەو منیش تا ئێستا ڕیبایەکی زۆرم وەرگرتوە، مانای وایە بۆم حەلاڵو زەلاڵە، چونکە خوا دەفەرموێ: ﴿ فَلَهُۥ مَا سَلَفَ ﴾، ئەوەی ڕابردوە بۆخۆی، منیش ئێستا تۆبە دەکەم، بەلام با ئەوەی لەمەودوام لەسەر حیساب بکرێ !! نەء، مادام خۆی بە مسوڵمان بزانێ، نابێ وابڵێ، بەڵێ ئەگەر کافربێو بڕوای بە ئەسڵی دین نەبێ، پابەندیش نابێ بە یاساکانییەوە، چونکە ئەوەی ئەسڵی دینی نەبێ داوای لێناکرێ بە لقو پۆپەکانیو بە حوکمە شەرعییەکانەوە پابەندبێ، بەلام بڵێ: مسوڵمانمو وەختی خۆی مامەڵەم بە ڕیبا کردوەو سەروەتو سامانێکی زۆرم پەیداکردوەو بۆم حەلاڵو زەلاڵەو، لەمەودوا تۆبە دەکەم، وە ئەم ئایەتە بۆخۆی بە بەڵگە بهێنێتەوە ! ئەوە لەڕاستیدا نایگرێتەوە، بەڵێ ئەگەر بڵێ: تا ئێستا مسوڵمان نەبووم‌و ئێستاکە بڕیارمدا مسوڵمان بم، ئەوە ئەو ئایەتە دەیگرێتەوە، بەلام لەمەو دوا دەبێ پابەندبێ.

بەلام بۆ ئەوەی ڕێی تۆبەکردنو گەڕانەوە بۆ لای خوا، لەسەر خەڵك بە زەحمەت نەخەین، لێرەدا دەگونجێ قسەیەکی دیکە بکرێ، بۆ وێنە: من نەفەری وا هاتوە بۆ لام گوتوویەتی: مامۆستا ئێستا دەمەوێ بگەڕێمەوە بۆ لای خوا، بەلام بەڕاستی هەرچی هەمە هەمووی حەرامەو بە کاروکەسابەتی حەرام پەیدام کردوە، جا ئایا ئێستا تەگبیرم چییە؟ کە من پێم وایە ئەوە لە فەتوادا جێگای دەبێتەوە کە بگوترێ: بایی ئەوەندە کە ژیانت پەکی لەسەرکەوتوەو پێداویستی ژیانتە، لای خۆت بیهێڵەوە، مادام هیچ چارەی دیکەت نیە[1]، وەك جێگاو ڕێگاو

---

١) بەلام بێگومان ئەوە بۆ بابای بێچارەو بێدەرتانە، ئەگەرنا کەسێك هیچ بواری دیکەی هەبێ، ئەوەی بۆ ڕەوانیە، هەروەها ئەوەش کە مۆڵەت (رخصة)و کەسێك کار بە عەزیمەت بکات ئەوە ناکاتو بێگومان خوای بەخشەریش پەکی پەندەی ساغو ڕاستی خی ناخات.

بژێوی خۆت و خێزانت، هەتا دەستت لە کەسابەتێکی حەڵاڵ گیردەبێ، دەگونجێ ئەوەندە بۆخۆت بهێڵیتەوەو، ئەوی دیکە بخەیە (بَیت المال)ێکەوە، یاخود بیخەیە بەرژەوەندیی گشتی مسوڵمانان و لە کۆڵ خۆتی بکەیەوە.

**مەسەلەی هەشتەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ وَأَمْرُهُۥٓ إِلَى ٱللَّهِ ﴾، ئەوە چەند شتێك دەگرێتەوە:

**یەکەم:** مانای وایە مافی خەڵکی لەسەر نیەو کەس بۆی نەبووە بڵێ: لە سەردەمی نەفامییدا ئەوەندەت ڕیبا لە من وەرگرتوەو ئێستا دەبێ بمدەیەوە !

**دووەم:** مانایەکی دیکەشی ئەوەیە کە سەرەنجامی ویش وەك خەڵکی دیکە بەدەست خوایە، یانی: کە خوای پەروەردگار دەفەرموێ: لەڕابردووی خۆشبووم، مەبەست تەنیا سود خواردنەکەیەتی کە ئەوساکە حەرام نەبووە، دەنا نابێ بڵێ: تازە پشتێندی هەندێ لێ دەکەمەوەو خوا لە هەموو شتێکم خۆشبووە ! نا، مەبەست تەنیا ئەوەیە کە قسەی لێ دەکرێ کە سوود خۆرییە، ئەمما ئەوی دیکە، ئەوە کاروباری بەدەست خوایە وەك باقی خەڵکی دیکەو، لەسەر چاکە پاداشتی دەدرێتەوەو لەسەر خراپە سزا دەدرێ.

**مەسەلەی نۆیەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ وَمَنْ عَادَ فَأُوْلَـٰٓئِكَ أَصْحَـٰبُ ٱلنَّارِ ۖ هُمْ فِيهَا خَـٰلِدُونَ ﴾، وە هەرکەسێك گەڕایەوە {واتە گەڕایەوە بۆ سوود خۆریی و مامەڵەکردن بە ڕیبا} ئا ئەوانە هاوەڵی ئاگرن، وە ئەوان بە هەمیشەیی تێیدا دەمێننەوە، پێشتریش ئاماژەم پێدا کە زانایان لێرەدا جۆرێك لە ئیشکالیان بۆ دروست بووە، دەڵێن: باشە چۆن دەگونجێ بابای سوود خۆر مسوڵمان بێ، لە حاڵێکدا کە خوا دەفەرموێ: هەرکەسێك گەڕایەوە بۆ سوود خۆریی، ئەوە دەبێتە هاوەڵی ئاگر، یان خاوەنی ئاگرو بە هەمیشەیی تێیدا دەمێنێتەوە !! دیارە زانایانی ئیسلامیش زۆربەی هەرە زۆریان بە سوننەو شیعەوە جگە لە (خَوارج)و (مُعتَزِلَة) دەڵێن: خاوەنی گوناهە گەورەکان لە دۆزەخدا بە هەمیشەیی نامێننەوە، با تۆبەشیان نەکردبێ، بە مەرجێك ئەو

گوناهە گەورانە نەگەیبنە ڕاددەی کوفری گەورەو شیرکی گەورەو نیفاقی گەورە، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِۦ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَآءُ ...(٤٨) ﴾النساء، واتە: خوا لەوە نابوورێ هاوبەشی بۆ پەیدا بکرێ {دیارە شیرکیش جۆرێکە لە جۆرەکانی کوفری}، بەڵام لە خوار ئەوەوە بۆ هەر کەسێك بیەوێ لێی دەبوورێ، هەڵبەتە بە تۆبەوە ئەوە مسۆگەر خوا دەبوورێ، بەڵام بەبێ تۆبەش خوای بەبەزەیی دەگونجێ هەندێ کەس لە گوناهە گەورەکانیش عەفوو بکات، وە دەشگونجێ عەفوویان نەکات، کە دیارە ئەوکاتە بە ئەندازەی گوناهەکەیان سزا دەدرێن و دوایی دەرباز دەبن، زۆربەی زانایان ئەوە ڕایانە، جگە لە (خَوارج)و (مُعتَزِلة) کە بە دڵنیایی لەو مەسەلەیەدا نەیانپێکاوە، چونکە ڕایەکەیان کە دەڵێت: هەرکەسێك گوناهێکی گەورەی کردبێ و تۆبەی لێ نەکردبێ، لە دۆزەخدا بە هەمیشەیی دەمێنێتەوە، پێچەوانەی چەندان ئایەت و چەندان فەرمایشتی پێغەمبەرە ﷺ، بۆیە دەڵێم: لێرەدا بە ڕواڵەت ئیشکالێك هەیە، جا زانایان ئاوا ئیشکالەکەیان حەلکردوە، دەڵێن: ﴿ وَمَنْ عَادَ ﴾، واتە: هەر کەسێك بگەڕێتەوە بۆ سوود خۆریی و بە حەڵاڵی بزانێ، وەك چۆن پێش قەدەغەکرانی بە حەڵاڵی زانیوەو گوتوویانە: ﴿ إِنَّمَا ٱلْبَيْعُ مِثْلُ ٱلرِّبَوٰا۟ ﴾، کڕین و فرۆشتن و ڕیبا وەك یەکن، هەرکەسێ ئەوە قەناعەتی بێ، ئەوە بەهۆی سوود خۆرییەکەیەوە کافر نابێ، بەڵام بەهۆی ئەوەوە کە سوود خۆریی، وەك کڕین و فرۆشتن تەماشا دەکات و، بڕوای بە حەرامبوونی نیە، کافر دەبێ، چونکە مانای وایە خوا ﷻ بە درۆ دەزانێ و، پێغەمبەر ﷺ بە درۆ دەزانێ و بەمەش ئەسڵی ئیمان و بەڕاست دانان (تصدیق)ەکەی هەڵدەوەشێتەوە، بۆیە لە دۆزەخدا بە هەمیشەیی دەمێنێتەوە، ئەگەرنا ئەگەر هەر سوود خۆرییەکە بووایە ئەوە تەنیا بەقەدەر ئەوەی کە سوودی خواردوەو، ئەو گوناهە گەورەیەی کردوە، سزا دەدراو دوایی دەربازی دەبوو.

مانایەکی دیکە: دەڵێن مەبەست ئەوەیە کە سوود خۆر سزایەکەی بریتییە لە مانەوەی هەمیشەیی لە دۆزەخدا، مادام پەرچێك نەبێت، کە دیارە ئیمانو خوا بە یەکگرتن ئەو پەرچەیە، واتە: بابایەك کە مامەڵە بە ڕیبا بکاو سوود بخوات، سزایەکەی ئەوەیە بە هەمیشەیی لە دۆزەخدا بمێنێتەوە ئەگەر ئیمانی نەبێ، بەڵام ئەگەر ئیمانی هەبێ، ئیمانەکەی ڕێگا دەگرێ لەوە کە لە دۆزەخدا بە هەمیشەیی بمێنێتەوە، هەروەها بۆ هەر گوناهێکی دیکەش بۆ قەتڵو زیناوو دزییو غەیبەتو درۆو بوختانو... هتد، بۆ ئەوانەش بەهەمان شێوە، ئیمان ڕێگا دەگرێ کە خاوەنی ئەو گوناهانە لە دۆزەخدا بە هەمیشەیی بمێنێتەوە.

وە دەگونجێ ئەو ئیشکالە بەوە چارەسەر بکرێ، کە بگوترێ: مەبەست لە: ﴿ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ ﴾، زۆر مانەوەیە لە دۆزەخدا، نەك بە هەمیشەیی مانەوە.

**مەسەلەی دەیەم:** کە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ يَمْحَقُ اللَّهُ الرِّبَا ﴾، خوا سوود لەبەین دەباتو نابوودی دەکات، لێرەدا مەبەست چییە؟ مەبەست ئەوەیە: کەسێك کە سوود دەخواتو پارەی زیاد لە خەڵکی وەردەگرێ لە بەرانبەر قەرزدا، بە ڕواڵەت دەوڵەمەند دەبێو سەروەتو سامانی پەزمەندە دەکات، بەڵام ئەگەر ئینسان بە وردییو بەشێوەیەکی دەروونزانانەو کۆمەڵناسانە تەماشای ئەوانە بکات، کە مامەڵە بە ڕیبا دەکەن، سوود لە خەڵکی وەردەگرن، دەزانێ کە بەڕاستیی سەروەتو سامانەکەیان پایەیەکی چەسپاوی نییە، بۆچی؟ چونکە سوود خۆر ئەو سەروەتو سامانەی وەسەر یەك ناوە، بێئەوەی کە ڕەنجێکی بۆ بداتو بەبێ ئەوەی ئارەقەی بۆ برێژێ، واتە: هی خەڵکە کۆی کردۆتەوە، جا لە ئەنجامی ئەوەدا کە هەموو بەری ڕەنجی ئەوانی دزیوە، لێی بە ڕقدا دەچنو هەمیشە ئەو دەوڵەمەندو سەروەتو ساماندارانەی کە ڕەنجی خەڵك دەدزن، بە شێوەی سوود، یان بەهەر شێوەیەکی دیکە، کینەو بوغزێکی زۆر دەخەنە دڵی خەڵکەوە لە بەرانبەر خۆیاندا، وە سەرەنجامیش کەم وایە ئەو جۆرە کەسانە، وە ئەو جۆرە کۆمەڵگایانە، بتوانن بەردەوام بن، بەڵکو چینە هەژارو ئاتاجو نەدارەکانو چینە چەوساوەکان، ڕادەپەڕن، وە سەرەنجام وەك خوا

دەفەرموێ: ﴿ يَمۡحَقُ ٱللَّهُ ٱلرِّبَوٰاْ ﴾، خوا سوود لەبەین دەبات، جا مەرج نیە لە ماوەی ساڵێك، یان دە ساڵو پەنجا ساڵدا، بەڵام سەرەنجام ئەم جۆرە سیستەمانە ناتوانن بەردەوام بن، چونکە کەمینەیەکی کەم لەسەر حیسابی زەربەدان لە زۆرینەی خەڵك، ئەو سەروەتو سامانە وەسەریێك دەنێن، وە ئەو جۆرە کۆمەلگایەش هاوسەنگیی کۆمەڵایەتییو ئابوورییان تێدا تێكدەچێو هەر کاتێکیش هاوسەنگیی لە ژیانی تاك، یان خێزان، یان کۆمەلگادا تێکچوو، ئەو کەسە، یان ئەو خێزانە، یان ئەو کۆمەلگایە، هەرەس دێنێ، ئێستاش زۆر بە زەقی دیارە کە سیستەمی سەرمایەداریی تووشی چ قەیرانێك بووە، ئەوە بۆ خۆمان دەیبینین !.

**مەسەلەیەی یازدەیەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ وَيُرۡبِي ٱلصَّدَقَٰتِۗ ﴾، خوا ﷻ صەدەقاتو خێرو چاکەکان گەشە پێدەدا، بەڕاستی ئەوە هەر لە دنیاشدا وایە، دیارە دەگونجێ مەبەست پێی دنیابێو دەشگونجێ مەبەست پێی قیامەت بێ، چ بۆ لەبەینبردنی ڕیباو، چ بۆ گەشەپێدانی زەکاتو خێرو صەدەقەو هاوکاریی، وە دەشگونجێ مەبەست پێی هەردووکیان بێ، کە من پێم وایە مەبەست پێی هەردووکیانە ﴿ يَمۡحَقُ ٱللَّهُ ٱلرِّبَوٰاْ ﴾، خوا ڕیباو سوود خۆریو سوود خۆران لەبەین دەبات، لە دنیاو دوارۆژدا ﴿ وَيُرۡبِي ٱلصَّدَقَٰتِۗ ﴾، وە ئەوانەی کە ماڵی خۆیان دەبەخشن بە شێوەی شەرعییو زەکات دەدەن، وە هاوکاریی خەڵك دەکەن بێ بەرانبەرو لەبەر خوا، ئەوانە خوا گەشەیان پێدەدات، لە دنیاشدا گەشەیان پێ دەداتو لە دوارۆژیشدا، وە دەربارەی گەشەپێدانی صەدەقاتو خێرو چاکە لەلایەن خواوە لە دوارۆژدا پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {(مَنْ تَصَدَّقَ بِعِدْلِ تَمْرَةٍ مِنْ كَسْبٍ طَيِّبٍ، وَلا يَقْبَلُ اللهُ إِلاَّ الطَّيِّبَ، إِنَّ اللهَ يَتَقَبَّلُهَا بِيَمِينِهِ، ثُمَّ يُرَبِّيهَا لِصاحِبِهِ، كَما يُرَبِّي أَحَدُكُمْ فَلُوَّهُ، حَتَّى تَكُونَ مِثْلَ الجَبَلِ) (مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ، البُخَارِيُّ بِرقم: (١٤١٠)، وَمسلم برقم: (٢٣٤٠)، عَنْ أَبِي هُرَيرَةَ رضي الله عنه}، واتە: هەر کەسێك خێر بکات بە ئەندازەی یەك دەنکە خورما لە ماڵێکی حەڵاڵ،

وە خوا ماڵی حەڵاڵیش نەبێ وەرناگرێ، ئەوە خوا بەدەستی ڕاستی لێی وەردەگرێ {دیارە دەستی ڕاستی خوای پەروەردگار سیفەتی خوایە، ئێمە دەڵێین: ئەوە سیفەتێكی خوای بێوێنەیە كە نازانین چۆنە ؟ یاخود تەعبیرێكە، واتە: خوای بەخشەر زۆر باشی لێ وەردەگرێ چونكە لە عادەتی میللەتان وایە كە ئەگەر كەسێك و شتێك وەربگرێ لە كەسێك و بە دڵەوە لێی وەربگرێ و لای زۆر خۆشەویست بێ، دەستی ڕاستی بۆ درێژ دەكا، ئەگەرنا بە دەستە چەپ هەروا لامسەللایی دەستی بۆ درێژ دەكات، وە پێم وایە مەبەست ئەوەیە كە خوای بەخشندە، زۆر بە خۆشحاڵییەوەو بە پەسەندو قەبووڵەوە ئەو چاكەیەی لێوەردەگرێ}، دوایی ئەو خێرو چاكەیە گەشە پێدەدا {بەخێو دەكاو گەورەی دەكا} بۆ خاوەنەكەی، وەك چۆن یەكێك لە ئێوە جوانووەكەی {واتە: بەچكەی ماین} بەخێو دەكات، هەتاكو ئەو خێرو چاكەیە، ئەگەر بە قەد دەنكە خورمایەكیش بێ، لە دواڕۆژدا خوا بۆی بە قەد چیایەك لێدەكات. واتە: ئەوەی كە لە دنیادا دەیبەخشێ با كەمیش بێ تا قیامەتێ زۆر گەورە دەبێ و خوای پەروەردگار مشووری لێ دەخواو گەورەی دەكا، وە لە دنیاشدا بەدڵنیایی هەروایەو ئەوەی خێرومەندو چاكەكارە، لای خەڵك سومعەی بەرزدەبێ و، كەسایەتی بەرزو خۆشەویست دەبێ، وە لە ئەنجامیشدا ماڵەكەشی بەرەكەتی تێدەكەوێ، بە پێچەوانەی سوود خۆرو حەرام خۆرانەوە، كە لە دنیاشداو بوغزو كینەی خەڵك بۆخۆیان بەرهەم دێنن، وە لە دواڕۆژیشدا ئەوەی كە وەدەستیان هێناوە لە ڕێی حەرام و ڕیباوە نابووت دەبێ و نەك هەر نامێنێ، بەڵكو بۆشیان دەبێتە مایەی ئازارو ئەشكەنجە.

**مەسەلەی دوازدەیەم:** خوای پەروەردگار كە دەفەرموێ: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَذَرُواْ مَا بَقِىَ مِنَ ٱلرِّبَوٰٓاْ ﴾، ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە ! پارێز لە خوا بكەن، وە ئەو سوودەی كە ماوە دەستی لێ هەڵگرن، كە لە دەرسەكانی پێشوودا باسمان كردو، هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتە موبارەكەمان خستەڕوو، ئەویش ئەوە بوو: كەسانێك هەبوون لە سەردەمی نەفامییدا

مامەڵەیان بە ڕیبا كردوەو، كاتێك كە ئیسلام هاتوەو ئەم ئایەتانە هاتوونە خوارو، ڕیبایان قەدەغە كردوە، ئەوانەی قەرزی ڕیبایان لەسەر كەسانێك مابوو، كە پارەیان پێدابوون، واتە: نەك ئەسڵی دەستمایەكە، بەڵكو تەراكومو زیادەی كە بەهۆی ڕیباوە چۆتە سەری، داوایان كردوەو خوای پەروەردگاریش قەدەغەی كردوە، چونكە دوایی كە دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَذَرُواْ مَا بَقِيَ مِنَ ٱلرِّبَوٰٓاْ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴾، لەم ڕستە قورئانییە وەردەگیرێ، كە سوود خۆریی پێچەوانەی ئیمانەو ئەوەی ئیمانی هەبێ چاوی لە سوود خۆریی نابێ‌و چاوی لە مامەڵەكردن بە ڕیبا نابێ، جا ئەگەر ئیمانەكەی ئیمانێكی تەواو بێ ئەوە بەتەواوای لێی دوور دەكەوێتەوە، وە بە ئەندازەی ئەوە كە لە ڕیبا نزیك دەبێتەوە، مانای وایە ئیمانی بێ هێزە، هەروەها كە دەفەرموێ: ﴿ وَذَرُواْ مَا بَقِيَ مِنَ ٱلرِّبَوٰٓاْ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴾، ئەوەشی لێوەردەگیرێ كە سوود خۆریی وێڕای سزای قیامەتی، سزای دنیایشی هەیە، بۆچی ؟ چونكە بڕواداران كاتێك ئیعلانی ئیمانی خۆیان دەكەن، كۆمەڵگایەك، میللەتێك دەڵێ: من مسوڵمانم، دەبێ پابەندبێ بە ئیسلامەوە، بە تایبەت لەو شتانەدا كە زیان دەگەیەنن بە بەرژوەندیی گشتی، وە دەستەڵاتی سیاسیی ئیسلامیی بۆی هەیە ڕێ لەو جۆرە شتانە بگرێ، كە زیان بە بەرژەوەندیی گشتی دەگەیەنن، شتێك كە لە بەرژەوەندیی توێژێكی كەم دایەو لە زەرەرو زیانی خەڵكدایە، دەبێ ڕێی لێ بگیرێ، ئنجا ئەوە دیارە كە سزای قیامەتیشی هەیە، چونكە شتێك كە پێچەوانەی ئیمان بێ‌و ئینسانی مسوڵمان ئەنجامی بدا، دیارە سزای قیامەتی لەسەرە، بەڵام وێڕای ئەوە سزای دنیایشی لەسەرە، چونكە شتێك پێچەوانەی مسوڵمانەتیی بێ، نابێ لەنێو مسوڵماناندا بكرێ، وە لەسەر دەسەڵاتی سیاسیی پێویستە ڕێی لێ بگرێ، جا ئەوە لە داهاتوودا زیاتر قسەی لێ دەكەین، لە مەسەلەیەكی دیكەداو قسەی هەندێ زانایانیش لەوبارەوە دێنینەوە.

دیارە لەوبارەشەوە چەند فەرموودەیەكی پێغەمبەر ﷺ هەن، یەكێكیان ئەمەیە: {(اجْتَنِبُوا السَّبْعَ الْمُوبِقَاتِ، قِيلَ يَا رَسُولَ اللَّهِ وَمَا هُنَّ ؟ قَالَ: الشِّرْكُ

بِاللَّهِ، وَالسِّحْرُ، وَقَتْلُ النَّفْسِ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلاَّ بِالْحَقِّ، وَأَكْلُ مَالِ الْيَتِيمِ، وَأَكْلُ الرِّبَا، وَالتَّوَلِّي يَوْمَ الزَّحْفِ، وَقَذْفُ الْمُحْصَنَاتِ الْغَافِلاَتِ الْمُؤْمِنَاتِ) (رَوَاهُ الْبُخَارِيُّ بِرقم: (٢٧٦٦)، وَمسلم برقم: (٢٥٨)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٢٨٧٤)، وَالنَّسَائِيُّ برقم: (٣٦٧٣)، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁}، واته: خۆتان لە حەوت (گوناهە) فەوتێنەرەكان بپارێزن! گوترا: ئەوانە چین ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی: هاوبەش بۆ خوا دانان‌و، جادووكردن‌و، بە ناهەق كوشتنی نەفسێك كە خوا قەدەغەی كردووە، خواردنی ماڵ هەتیوو خواردنی سوودو، لە كاتی هێرشی دوژمندا پشت تێكردنی‌و بوختانكردن بۆ ئافرەتانی پاكی بێئاگای بڕوادار.

هەروەها پێغەمبەر ﷺ لە فەرموودەیەكی دیكەدا، كە عەبدوڵڵای كوڕی مەسعوود خوا لێی ڕازی بێ، دەیگێڕێتەوە، فەرموویەتی: {(لَعَنَ رَسُولُ اللهِ ﷺ آكِلَ الرِّبَا، وَمُوكِلَهُ، وَشَاهِدَهُ، وَكَاتِبَهُ) (رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ برقم: (٣٣٣٣)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٢٢٧٧)، وَصَحَّحَهُ الألباني}، واته: پێغەمبەری خوا ﷺ نەفرینی كردووە، لەو كەسە كە سوود دەخوا، وە ئەو كەسەی كە سوودەكە دەدات‌و دەبێتە هۆی ئەنجامدانی ئەو مامەڵەیە، وە ئەو دوو كەسە كە دەبن بە شاهێد، وە ئەو كەسە كە دەینووسێ، كەواتە: هەموو ئەوانەی دەستیان دەبێ لە مامەڵەكردن بە ڕیبادا، وەبەر ئەو لەعنەت‌و نەفرینە كەوتوون!

هەروەها ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر ئەوە كە سوود خۆریی سزای دنیاییشی لەسەرەو مەسەلەی سوودو ڕیباو دەستەڵاتی سیاسیی ئیسلامیی بۆی هەیە ڕێی لێ بگرێ، كە پێغەمبەر ﷺ لە ڕۆژی فەتحی مەككەدا فەرموویەتی: {(وَكُلُّ رِباً في الجاهلِيَةِ مَوْضوعٌ تَحْتَ قَدَمَيَّ هَاتَيْن وأَوَّلُ رِباً أَضَعُ رِبَا العَبَّاسِ بْنِ عَبْدُ المُطلب) (رَوَاهُ أبو داود)}، واته: هەرسوودێك لە سەردەمی نەفامییدا بووبێ، لەژێر ئەو دوو پێیانەم دایە، وە یەكەمین سوودێك كە لای دەبەم لەسەر قەرزدارەكان، ئەو سوودەیە كە هی عەبباسی كوڕی (عَبد المطلب)ە، واته: ئەو ماڵە زیادەی كە بەهۆی مامەڵەكردن بە ڕیباوە لەسەر هەر كەسێكە، ئەوە لام برد پێش هەموو كەس هی مامی خۆم عەبباس، كە پێشتر باسمان كرد

دەوڵەمەند بووو مامەڵەی بە سوود کردوە لە سەردەمی نەفامییدا.

**مەسەلەی سێزدەیەم: قۆناغەکانی قەدەغەکرانی مامەڵەکردن بە سوود:**

سەرەتا چەند ئایەتێك لە قورئاندا هاتوونو هەنگاو بە هەنگاو بەرچاوی مسوڵمانانیان ڕوونکردۆتەوە، سوود خۆریی سەرەنجام قەدەغە دەکرێ، هەتا سەرەنجام بە ڕاشکاویی قەدەغەکرانی سوود ڕاگەیەنراوە:

**یەکەم:** یەکەم ئایەتیش لەوبارەوە ئایەتی ژمارە (٣٩)بوو، لە سوورەتی (الروم)دا، کە خوا دەفەرموێ: ﴿ وَمَآ ءَاتَيْتُم مِّن رِّبًا لِّيَرْبُوَا۟ فِىٓ أَمْوَٰلِ ٱلنَّاسِ فَلَا يَرْبُوا۟ عِندَ ٱللَّهِ ۖ وَمَآ ءَاتَيْتُم مِّن زَكَوٰةٍ تُرِيدُونَ وَجْهَ ٱللَّهِ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُضْعِفُونَ ﴿٣٩﴾ ﴾، واتە: هەر ڕیبایەك کە دەیدەن {هەر ماڵێك کە دەیدەن بۆ ئەوەی لە ماڵو سامانی خەڵکیدا زیادەتان بۆ بێنێ} ئەوە لە لای خوا زیاد ناکات، بەڵام هەر زەکاتێك کە دەیدەن لە پێناوی ڕەزامەندیی خوادا، ئا ئەوانە بۆیان دوو چەندان دەکرێتەوە، ئەمە ئاماژە بوو بەوە کە ڕیبا شتێکی ناپەسندە، دیارە ئەوەش لە سوورەتی (الروم)دا هاتوە، کە سوورەتێکی مەککەییە، کەواتە: هەر لە مەککەوە خوا ﷻ زەمینەی خۆشکردوە بۆ قەدەغەکردنی ڕیبا.

**دووەم:** دووەمین ئایەتی ژمارە (١٦١)ە، لە سوورەتی (النِساء)دا، کە ئەویش هەنگاوێکی دیکەیە، خوا دەربارەی جوولەکەکان دەفەرموێ: ﴿ وَأَخْذِهِمُ ٱلرِّبَوٰا۟ وَقَدْ نُهُوا۟ عَنْهُ وَأَكْلِهِمْ أَمْوَٰلَ ٱلنَّاسِ بِٱلْبَٰطِلِ ۚ وَأَعْتَدْنَا لِلْكَٰفِرِينَ مِنْهُمْ عَذَابًا أَلِيمًا ﴿١٦١﴾ ﴾ واتە: یەکێك لە هەڵەو گوناحەکانی جوولەکەکان ئەوەبوو، کە سوودیان وەردەگرت لەگەڵ ئەوەش کە لێی قەدەغە کرابوون {لە کتێبی خۆیاندا کە تەوراتە}[1]، وە جگە لە ڕیباش بەهەر جۆرێکی دیکەش لێیان هەڵکەوتبا

---

١) بڕوانە: (التفسير التطبيقي للكتاب المقدّس)، (العهد القديم، سفر التثنية، الإصحاح: (٢٣)، ص: (٣٩٧)، کە دەڵێ: (لا تتقاضَوا فوائدَ عمّا تُقرِضونَهُ لإخوتكم من بني إسرائيل، سواء كانت القروض فضَّةً أو أطعمةً أو أيَّ شيءٍ آخر، أما الأجنبيُّ فأقرِضوه بِرِباً...)، کە من پێم وایەو بگرە دڵنیاشم، ئەوە کە دەڵێ: (أما الأجنبيُّ فأقرِضوه برِباً)، واتە بەڵام بێگانە، (یانی

ماڵو سامانی خەڵکیان بە ناهەق دەخوارد، کە دیارە سوود خۆرییش یەکێکە لە شێوەکانی ماڵی خەڵك بە ناهەق خواردن، کەواتە: ئەمەش هەنگاوێکی دیکەیەو ئاماژەیەکی دیکەیەو ئەمەش لە سوورەتی (النساء)دا هاتۆتە خوار کە سوورەتێکی مەدەنییە، کەواتە: ڕیباو سوود لەسەر جوولەکەکانیش کاتی خۆی قەدەغە کراوە.

**سێیەم**: ئایەتی ژمارە (١٠٣) بوو لە سوورەتی (آل عمران)دا کە ئەویش زەمینەسازیی زیاتری تێدایە، کە دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَأۡكُلُواْ ٱلرِّبَوٰٓاْ أَضۡعَٰفٗا مُّضَٰعَفَةٗۖ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ١٣٠ ﴾، واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! سوود مەخۆن چەند قات {چەند بەرانبەر بووەوە}، وە پارێز لە خوا بکەن، بۆ ئەوەی سەرفرازبن، واتە: ئەو زێدەبایی‌و ئەو سوودەی کە چۆتە سەری، بە چەند قات مەیخۆن، لێرەدا توێژەرەوان دەڵێن: خوای پەروەردگار پێشێ ئەو جۆرە سوودو مامەڵەکردن بە ڕیبایەی قەدەغە کردوە، کە زۆر کەڵەکە دەبێتەوە، بەڵام ئەوەی سوودی کەمتر دەچێتە سەر ئەم ئایەتە نایگرێتەوە، وە هەندێکیش دەڵێن: هەر لەو کاتەوە خوای دادگەر قەدەغەی کردوە، بەڵام ڕای ڕاست ئەوەیە کاتێك ئەو ئایەتانەی کە لە سوورەتی (البقرة)دان‌و لە کاتی فەتحی مەککەدا هاتوونە خوار، لە دوادوای هاتنە خواری قورئاندا، ئەو کاتە ڕیبا یەکجاریی قەدەغە کراوە، بۆیە وا پێدەچێ ئایەتەکەی سوورەتی (آل عمران) یان دەبێ دواتر هاتبێ، یان دەبێ هەر لەو سەروحەدەدا هاتبێ، یان ئەوەتا مەبەست پێی ئەوەیە کە: کەسێك کە بەهۆی ڕیباوە چەند بەرانبەر پارەی کەوتبێتە سەر کەسێك، قەدەغەیە، ئەگەرنا ئەوەی دیکە، قەدەغە نیە.

**چوارەم**: کە کۆتا قۆناغە بۆ قەدەغەکرانی ڕیبا، ئەم ئایەتە موبارەکەی سوورەتی (البقرة) بوو، کە دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَذَرُواْ مَا بَقِيَ

---

غەیری جوولەکە) ئەوە بە سوود قەرزی پێبدەن، لەوەیە کە جوولەکە تەحریفیان کردوە، ئەگەرنا شەریعەتەکانی خوا لە بواری هەڵس‌وکەوتدا جیاوازیی ناخەنە میللەتانەوە!

مِنَ ٱلرِّبَوٰٓاْ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ ﴿٢٧٨﴾﴾، واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! پارێز لە خوا بکەن، وە ئەو سوودەی ماوە دەستی لێهەڵگرن ئەگەر ئیماندارن.

**مەسەلەی چواردەیەم: هۆکارو حیکمەتەکانی قەدەغەکرانی سوود چین؟**

دیارە دەگونجێ لەوبارەوە زۆر شت باسبکرێ، بەڵام بە کورتی ئاماژە بە هەندێکیان دەکەین:

**یەکەم**: سوود خۆریی زوڵمە، چونکە وەرگرتنی زیادەیە کە بەبێ کۆشش‌و ماندووبوون‌و ئارەقەکردن، کابرا هەر لەو گۆڕە پارەیەکی نەقد دەداتە کەسێك‌و دەستمایەو پارەکەی هەر لە جێی خۆیەتی‌و، مانگانەش دەبێ بابای قەرزدار زیادەی بداتێ، بۆ وێنە: یەکێك ملیۆنێك دۆلار لە بانق دادەنێ، مانگانە پارەی زیادە ڕادەکێشێ، لەسەر حیسابی کێ؟ لەسەر حیسابی خەڵك‌و دەوڵەت، هیچ گومانیشی تێدانیە کە ئەوە زوڵمێکی گەورەیە لە خەڵك‌و وڵات بە گشتی دەکرێ.

**دووەم**: ڕیبا دەوڵەمەندەکان فێری مشەخۆریی‌و تەنبەڵی دەکات، کە لەسەر ڕەنجی خەڵك بژین، وە خۆیان هیچ دەست نەجووڵێنن، بەڵام ئەگەر ڕیبا نەبێ، بچۆ پارەکەت بجووڵێنەو بازرگانیی‌و کەسابەتی پێبکە، بەڵام بە هۆی ڕیباوە، کابرا لە ماڵی دانیشتوەو لاقی لەسەر لاقی داناوە، پارەی لە بانق داناوە، یاخود خستوویەتە مامەڵەی سوودەوەو بۆخۆی پارەی بەبێ ئارەقەکردن بۆ دێتەوە!

**سێیەم**: لە ئەنجامی سوود خۆرییداو لە ئەنجامی ئەو سیستەمە زاڵمانەیەدا، کێشەو بوغزو غەرەز لەنێوان ساماندارو، هەژارو نەداراندا پەیدادەبێ، چونکە بابای هەژارو نەدار کە دەزانێ ئەو ساماندار دەوڵەمەندە، لەسەر حیسابی وی دەوڵەمەند بووە، کینەو بوغزی دەچێتە دڵ‌و ڕقی لێهەڵدەستێ‌و، لە دەرفەتێك دەگەڕێ زەربەیەکی لێ بدات.

**چوارەم**: سوود خۆریی دەبێتە مایەی نەمانی تەبایی‌و هاوکاریی‌و دەست قەرز بە خەڵك دان، کە پێی دەگوترێ: (القَرْضُ الحَسَن)، واتە: قەرزی چاك، ئەو قەرزەی کە بێ بەرانبەرە، ئەوە نامێنێ مادام کابرا ڕێی ڕیبای هەبێ، دەڵێ:

من ئەنـدازە پارەیـەك دەدەم بـەو فەقیـرەو، مانگانـە سـوودی لـێ وەردەگرم‌و پارەکەی خۆشم هەر لە جێی خۆیەتی، بێگومان ئەوە باشترە لـە قـەرزێکی بـێ بەرانبەر! هەڵبەتە بۆ ئینـسانی مـسوڵمان ئـەوە دەزانـێ کـە قەدەغەیـە، بـەڵام مەبەسـتم ئەوەیـە، کـە ئـەوە بـوو بـە بنـچینەی گـشتی‌و ئـیشی پێکـرا، وەك ئێستا لە وڵاتـانی ڕۆژئاواو لە دنیادا ئیشی پێ دەکرێ، ئەو زوڵمە زلـە دەبێتـە شتێکی ئاسایی.

**پێنجـەم**: ئنجـا لـە ئـەنجامی سوود خۆرییـدا، لـەنێوان پێکهاتـەکانی کۆمەڵگـادا شـەڕو ئـاژاوەو دووبـەرەکیی وە چینایەتیی‌و قـڕو پڕییـەکیی زۆر پەیـدادەبێ، ئـەوەی دەوڵەمەنـدە دەوڵەمەنتـر دەبـێ‌و، ئـەوەی هـەژارە هـەژارتر دەبـێ، چونکە ئەوەی هـەژارو نـەدارە، پارە وەردەگرێ‌و سوودی دەچێتە سەرو هـەر بۆخـۆی هـەژارە، هێنـدەی دیکـە هـەژارتر دەبـێ، وە ئـەوەی دەوڵەمەندیشە بێئـەوەی خـۆی بجووڵێنـێ، هێنـدەی دیکـە دوەڵەمەنـد دەبـێ‌و سـەرەنجام کۆمەڵگا دابەش دەبێ بۆ دوو چیـن :

١- کەمینەیەکی پڕی لەسەر ڕژاو.

٢- زۆرینەیـەکی قـڕی لەبـەر بـڕاو، کـە ئێـستا لـە وڵاتـانی ڕۆژئـاوادا وایـەو سـەروەت‌و سامانی هەموو دنیا لە جیهانی سەرمایەدارییدا، دەچێتە دەستی چـەند کەسـانێکی کەمـەوەو، ڕۆژ بـەڕۆژیش دەوڵەمەنـدەکان ژمارەیـان کـەم دەبـێ‌و سـامانیان زیـاد دەبـێ، وە ڕۆژ بـەڕۆژیش خـەڵکێکی ئاتـاج‌و موحتـاج ژمارەیـان زۆردەبـێ‌و سەرەنجـام هـەرەس ڕوودەدات، خـوا کـاربەجێ لـە سوورەتی (الإسراء) ئایەتی (١٦)دا دەفەرموێ: ﴿ وَإِذَآ أَرَدۡنَآ أَن نُّهۡلِكَ قَرۡيَةً أَمَرۡنَا مُتۡرَفِيهَا فَفَسَقُواْ فِيهَا فَحَقَّ عَلَيۡهَا ٱلۡقَوۡلُ فَدَمَّرۡنَٰهَا تَدۡمِيرًا ﴾، واتـــە: وە ئەگـــەر ویستمان ئـاوەدانییەك کاول بکـەین، فـەرمان دەکـەین بـە خۆشگوزەرانەکانی، {واتـە: فـەرمانیان پـێ دەکـەین بـە چاکەو هاوکـارییکردنی خـەڵك} کەچـی ئـەوان خراپـەکاری تێـدا دەکـەن، سـەرەنجام بڕیـاری لەسـەر پێویـست دەبـێ {بڕیارو یاسای خوای لەسەر پێویست دەبێ} و کاولـی دەکەین‌و بە کاولکردن،

کەواتە: لە ئەنجامی فیسقو فەسادو لادانی خۆشگوزەرانەکاندا، کۆمەڵگاو ئاوەدانییەکان تێکدەچن‌و هەرەس دێنن، ئێستاش ئەم یاسایەی خوا بەسەر ژمارەیەك لە وڵاتانی عەرەبیی، وەك (تونس)و (میسر)و (لیبیا)و (سووریا)و (یەمەن)دا، چەسپاوەو زۆر بەدرەوشاوەیی دیارەو دڵنیام – بە پێی یاساو سوننەتی دادگەرانەی خوا كە هی دیكەش بەڕێوەن، بەوەنیە كە جارێ ڕژێمەكانیان – وەك گۆچانی مۆرانە لێدراوی سولەیمان- هەر بە پێوەن !!

**مەسەلەی پازدەیەم:** سزاو حوكمی سوود خۆریی لە دنیاداو لە دوارۆژدا:
پێشتریش باسمان كردو هەندێ فەرمایشتی پێغەمبەر ﷺ هەن كە من بە پێویستم نەزانی پێشتر هەموویان بێنم، كە زۆر بەشێوەیەكی قێزەون باسی سوود خۆریی دەكەن، هەتا لە یەكێ لە فەرمایشتەكاندا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: {(الرِّبَا اثنَانِ وَسَبْعُونَ بابًا، أدْنَاهَا مِثْلُ إتْيَانِ الرَّجُلِ أمَّهُ...) رَوَاهُ الطبراني في (الأوسط) برقم: (٧١٥١)، وَصَحَّحَهُ الألباني في (صحيح الجامع) برقم: (٢٥٦٣)}، واتە: سوود خۆریی حەفتاو دوو دەرگای هەیە، كەمترینیان ئەوەیە كە كابرا زینا لەگەڵ دایكی خۆیدا بكا، وە لە فەرموودەیەكی دیكەدا كە (أحمد[1] والدار القطني والطبراني) هێناویانە دەفەرموێ: (لَدِرهَمُ رِباً أشدُّ عند الله تعالى من سِتٍّ وثلاثين زنْيَةٍ في الخطيئة) واتە: یەك درەم سوود خۆریی، لەلای خوای بەرز لە سی‌و شەش زینا خراپترە، سوود خۆریی كەواتە: وە لە فەرموودەیەكی دیكەدا هاتوە: (آكِلُ الرِّبا ومُوكِلُهُ وكاتِبهُ وشاهِدُهُ ملعونٌ على لِسانِ محمّدٍ ﷺ) أخرجه النسائي: (٨/ ١٤٧)، وأحمد (٤٠٩/١، ٤٣٠)، وإبن حِبّان: (٣٢٥٢)، وإبن خزيمة: (٢٢٥٠)، وأبو يعلى: (٥٢٤١)، وصحّحه الألباني في (صحيح سنن النسائي): واتە: سوود خۆرو، سوود پێ‌خۆر (سوو دەر) و نووسەری‌و شایەدی لەسەر زمانی موحەممەد ﷺ لەعنەتیان لێكراوە زۆر شتێكی پیس‌و خراپە، جا ئینسان كە بە ڕواڵەت تەماشا

---

١) بڕوانە: (صحيح الجامع): (٣٣٧٥).

بکـات دەڵـێ: ئـەوە بۆچـی وایــە؟ بـەڵام نـەخێر، لـە ئـەنجامی سـوود خۆرییـدا شیــرازەو هاوسەنگــیی کۆمەڵگـا تێکدەچێ‌و، سـەرەنجام زینـاو قەتـڵ‌و دزیـی‌و خراپەو... هتـد، زۆر تەشـەنە دەکـەن، جا بـە نیـسبەت سزای دنیـایی یـەوە بۆ سوود خۆریی، خـوا دەفـەرموێ: ﴿ فَإِن لَّمۡ تَفۡعَلُواْ فَأۡذَنُواْ بِحَرۡبٖ مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦۖ ﴾، واتـە: جـا ئەگـەر دەسـتتان هەڵنـەگرت، ئـەوە ئاگـادار کراونـەوە کـە جەنگتانـە لەگەڵ خـواو پێغەمبـەرەکەیدا.

زانایـان لـەم ڕسـتە قورئانییـە وەریانــگرتوە، کـە ئـەوە هەڕەشـەیە بـە سـزای دنیــاییی‌و، دەســەڵاتی سیاســیی‌و دەوڵــەتی ئیــسلامیی دەســتی کراوەیــە بــۆ مامەڵەکردن لەگەڵ سـوود خۆران‌و مامەڵەکـەران بە ڕیبـادا، بۆیـە ئـەم قـسەیە لە عەبدوڵـڵای کوڕی عەبباسـەوە خوا لێیان ڕازی بێ، گێڕراوەتـەوە: {(قَالَ ابْنُ عَبَّاس مَنْ كَانَ مُقِيماً عَلَى الرِّبا لاَ يَنزَعُ عَنْهُ فَحَقٌ عَلَى إمَام المسلمِين أن يَسْتَتِيبَهُ، فَإن نَزَعَ و إلاَّ ضَرَبَ عُنُقَهُ)[1]}، واتـە: عەبدوڵـڵای کوڕی عـەبباس دەڵـێ: هەرکەسێك بەردەوام بێ لەسەر خواردنی ڕیبا {لەسەر مامەڵەکردن بە ڕیبـا} وە دەستی لـێ هـەڵنەگرێ ئـەوە پێویـستە لەسـەر پێشـەوای مـسوڵمانان {دەستـەڵاتداری مـسوڵمانان} کـە داوای پەشێمانــبوونەوەی لێبکات، جا ئەگـەر دەستی هەلگرت، ئەگەرنا بۆی هەیـە لـە گـەردنی بـدات! وە یەکـێ لـە زانایـانی حەنەفیی مەزهەب کە (إبن خويز منداد)ە دەڵێ: {(وَلَوْ أنَّ أهْلَ بَلَدٍ اصطلَحوا عَلَى الرِّبا استحلالاً كانوا مُرتَدينَ، والحُكمُ فِيهِم كالحُكم في أهْلِ الرِّدةِ، وإنْ لَمْ يَكُن ذَلِكَ مِنهُم إستحلالاً جَازَ لِلإمامِ مُحارَبَتَهُم، ألا تَرى أنَّ اللهَ تَعَالى قَدْ أذِنَ في ذَلِكَ فَقَالَ: ﴿ فَأۡذَنُواْ بِحَرۡبٖ مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦۖ ﴾)}[2]، واتە: ئەگەر خەڵکی وڵاتێك (خەڵکی شوێنێك) لەنێو خۆیاندا ڕێککەوتن لەسەر ئەوە کە سوود خۆریی بە حەڵاڵ بزانـن، ئەوە بە هەڵگەڕاوە لـە قەڵـەم دەدرێـن،

---

١) (الجامع لأحكام القرآن) للقرطبي، ج: (٣)، ص: (٣١٨).

٢) سـەرچاوەی پێشوو، هەمـان بەرگ‌و لاپـەڕە.

وە حوکمی ئەوان وەك حوکمی ئەوانەیە کە لە دین هەڵدەگەڕێنەوە، بەڵام ئەگەر لەڕووی بە حەڵاڵ دانانیەوە نەبێ بەڵکو هەر مامەڵەی پێبکەن {بڵێن: حەرامە بەڵام مامەڵەی پێ دەکەین} ئەوە دروستە بۆ پێشەواو سەرکردەی مسوڵمانان کە لەگەڵیاندا بجەنگێ، ئەدی نابینی خوای بەرز مۆڵەتی داوە کە لەگەڵیاندا بجەنگن، وەك دەفەرموێ: ﴿ فَأْذَنُوا۟ بِحَرْبٍ مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ﴾، جا هەرچەندە زانایانی ئیسلام مشتومڕیان لەوبارەیەوە هەیە، بەڵام زیاتر ڕایان وایەو ئایەتەکەش زۆر ڕوونو ڕاشکاوە، کە دەستەڵاتی ئیسلامیی لەسەری پێویستە ڕێ لە سوود خۆران بگرێ، وە هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتەکان ئەو بەسەر هاتانەش کە پێشتر باسمان کردنو هەڵوێستی پێغەمبەریش ﷺ، کە دوایی دەفەرموێ: ڕیبای سەردەمی نەفامیی هەمووی لەژێر ئەم دوو پێیانەم دایە، پێش هەموو کەسیش ڕیبای عەبباسی مامم، وە ئەوە کە پێغەمبەر ﷺ ڕێی گرت لەوانە کە قەرزی ڕیبایان لەسەر خەڵکی بوو کە لێیان وەربگرنەوەو هەڵیوەشاندەوە، ئەوە هەمووی بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە دەستەڵاتی ئیسلامیی بۆی هەیە ڕێگا بگرێ لە سوود خۆران، ئەو جۆرە مامەڵەیە بکەن، وە ئەگەر کردیشیان سزایان بدات، بەڵام سزایەکەی دیاری نەکراوەو دەگەڕێتەوە بۆ ئیجتیهادو بۆچوونی دەسەڵاتی سیاسیی.

**مەسەلەی شازدەیەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ وَإِن تُبْتُمْ فَلَكُمْ رُءُوسُ أَمْوَٰلِكُمْ لَا تَظْلِمُونَ وَلَا تُظْلَمُونَ ﴾، واتە: وە ئەگەر پەشیمان بوونەوەو دەستتان لە سوود خۆریی هەڵگرت، ئەوە دەستمایەو سەرمایەکانتان هی خۆتانن، وەك دەبینین لێرەدا ئیسلام دان بە موڵکایەتی تاکیی دا دێنێ، چونکە لەوبارەوە دوو سیستەمی ئابووری هەن:

**یەکەم:** سیستەمی سەرمایەداریی (کاپیتالیزم): کە بەبێ سنوور ئازادیی دەدا بە تاك دەوڵەمەند ببێ، با لەسەر حیسابی خەڵکیش بێو، با بازرگانیی بە شتی قەدەغەو پیسیشەوە بکاتو، با زەرەر لە کۆمەڵگاش بدات، تاك ئازاد دەکات بە کەیفی خۆی سەروەتو سامان پێکەوە بنێو پەزمەندەی بکات.

**دووەم:** سیستەمی هاوبەشێتی (سۆسیالیزم): کە ئەویش بە پێچەوانەوە زیاتر لای کۆمەڵگا دەگرێ لەسەر حیسابی تاك، وە بڕوای بە موڵکایەتی تاکی نیە، واتە: لە سیستەمی سۆسیالیستییدا هیچ کەس خاوەنی هیچ شتێك نابێ‌و هەموو شتێك هی دەوڵەتە، جا ئیسلام لەو نێوانەدایە، سیستەمی ئابووریی ئیسلام نە کاپیتالیزمە نە سۆسیالیزم، بەڵکو ڕێیەکی نێوەڕاستی گرتووەو لە لایەکەوە دان بە موڵکایەتی تاکییدا دێنێ بۆ تاك، بەڵام سنوورداری دەکات‌و ڕێی لێ دەگرێ کە زیان بە خەڵکی بگەیەنێ، یەکێ لەوانە ڕێی مامەڵەکردن بە ڕیبای لێ دەگرێ، وە ڕێی قومارو مامەڵەکردن بە شتی پیس‌و زیان بەخشی لێ دەگرێ، وە هەرشتێك زەرەری بۆ خەڵك هەبێ، نابێ مامەڵەی پێ بکات، وەك ماددە سەرخۆشکەرەکان، وە کۆمەڵێك ئەرکیش لەسەر دەوڵەمەندەکان دادەنێ کە یەکیان زەکاتە، لە پێناوی بەرژەوەندیی گشتیدا، بە کورتی: سیستەمی ئابووریی ئیسلامیی خاڵی هاوبەشی هەیە لەگەڵ هەرکام لە کاپیتالیزم‌و سۆسیالیزمدا، بەڵام خاڵی جیاوازیشی هەن‌و سیستەمێکی سەربەخۆیە.

**مەسەلەی حەفدەم:** کە دەفەرموێ: ﴿لَا تَظْلِمُونَ وَلَا تُظْلَمُونَ﴾، نە زوڵم بکەن نە زوڵمتان لێبکرێ، ئەوە بنچینەیەکی ئیسلامییەو ئیسلام دەیەوێ لە هەموو ڕوویەکەوە مسوڵمانان نە زاڵم بن نە مەزلووم‌و، نە مافی خەڵکی پێشێل بکەن‌و نە خەڵك مافیان پێشێل بکات، نە هەقی خەڵك بە لای وان دابێ‌و نە هەقی وان بەلای خەڵکیدا بچێ، ئەوەش داد (عَدل)ە چونکە (داد) ئەوەیە کە نە زاڵم بی نەمەزلووم.

**مەسەلەی هەژدەیەم:** ئەوە کە دەفەرموێ: ﴿وَإِن كَانَ ذُو عُسْرَةٍ فَنَظِرَةٌ إِلَىٰ مَيْسَرَةٍ﴾، وە ئەگەر تەنگ دەست بوو، با چاوەڕێ بکرێ تاکو ئاسانیی بۆ دێت، واتە: تاکو خوا دەرگای خێری لێ دەکاتەوە، ئنجا پێشتریش باسمان کرد کە زانایان لەوبارەوە کە: ئایا ئەوە تەنیا بۆ ئەوانەیە بە سوود پارەو قەرزیان

وەرگرتـووەو، لەسـەر خـاوەن پارەکـان فـەرزە کـە چـاوەڕێیان بکـەن، یـاخود هـەر قەرزدارێك پێویستە خاوەن قـەرز چاوەڕێی بکات ؟! زانایان مـشتومڕیان هەیـە، ئایەتـەکەش هەرچەنـدە لە سیاقی ئەو ئایەتانـەدا هاتوە، کە دەربارەی مامـەڵەکردن بە ڕیبا دەدوێن، بەڵام دەشگونجێ بۆ هەموو حاڵەتـەکانیش بـەکاربهێنرێ‌و، ئـەم فەرموودانەی پێغەمبەریش ﷺ زیاتر ئەو مەسەلەیە ڕووندەکەنەوە:

**فـەرموودەی یەکـەم:** {مَـنْ أَنْظَـرَ مُعْسِراً فَلَـهُ بِكُـلِّ يَـوْمٍ مِثْلُـهُ صَدَقَةٌ، قَالَ: ثُمَّ سَمِعْتُهُ يَقُولُ: (مَنْ أَنْظَرَ مُعْسِراً فَلَهُ بِكُلِّ يَومٍ مِثْلاَهُ صَدَقَةٌ) (رَوَاهُ ابْنُ مَاجَهْ بـرقم: (٣٤١٨)، عَنْ بُرَيـدَةَ الأَسْلَـمِيِّ رضي الله عنه، صـحَّحهُ الألبـاني فـي (السلـسلة الصحيحة) برقم: (٨٦)}، واتە: هەرکەسێك چاوەڕێی بابایەکی تـەنگ دەست بکات کە قەرزدارە، {یا لەکاتی خۆیشی تێپەڕێت}بە هەر ڕۆژێك بە ئەنـدازەی ئـەو قـەرزەی کـە لەلایـەتی خـوا صـەدەقەو خێـری بـۆ دەنووسـێ، {بـۆ وێنـە: ملیۆنێـك دینـاری داوەتـێ‌و، ساڵێکی بەسـەردا تێپـەڕیوەو بـۆ مـاوەی ساڵێك داویەتێ، دوای ساڵەکە دەڵێ: نیمەو جارێ چاوەڕێم بکە، چەند ڕۆژانـی صـەبر لـێ بگـرێ، هـەموو ڕۆژێـك بەقـەدەر ئەنـدازەی قەرزەکـە بـۆی بـە صـەدەقە دەنووسرێ} دەڵێ: دوایـی گـوێم لـە پێغەمبـەر ﷺ بـوو فـەرمووی: هەرکەسێك چاوەڕێی تەنگ دەستێك بکات، بە هـەر ڕۆژێـك دوو بەرانبـەری قەرزەکەی بۆی بە چاکەو خێر دەنووسرێ.

**فەرمـــوودەی دووەم:** {(مَـنْ نَـفَّسَ عَـنْ غَرِيمِـهِ، أَوْ مَحَـا عَنْـهُ، كَـانَ فِـي ظِـلِّ الْعَـرْشِ يَـوْمَ الْقِيَامَـةِ) (رَوَاهُ أَحْمَـد بـرقم: (٢٢٤٥٨)، عَـنْ أَبُـو قَتَـادَةَ الأَنـصَارِيِّ رضي الله عنه، وَصَــحَّحَهُ الألبــاني فــي (صــحيح الجــامع) بــرقم: (٦٤٠٢)}، واتــە: هەرکەسێك لەسەر قەرزدارەکەی سووك بکـا {یـانی: بـۆی دوا بخـات} یاخـود لێی بـسڕێتەوەو لەسـەری لابـەرێ {بـۆ وێنـە: دە ملیـۆن دینـاری لەسـەریەتی، بڵێ: ئەوە دوو ملیۆنـم لەسـەر لابـردی، پێـنجم لەسـەر لابـردی، مـادام توانـات نیـە}، ئەوە لە ڕۆژی قیـامـەتـدا لە سێبەری عەرشـدا دەبـێ.

**فەرموودەی سێیەم:** {(عَنْ أبي هُرَيرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ أنَّ رَسولَ اللهِ ﷺ قالَ: كَانَ رَجُلٌ يُدايِنُ النَّاسَ فَكَانَ يَقولُ لِفَتَاهُ إذَا أتَيتَ مُعَسِراً فَتَجَاوَزْ عَنْهُ لَعَلَّ اللهُ يَتَجاوَزُ عَنَّا فَلَقِيَ اللهُ فَتَجاوزَ عَنهُ) (مُتَّفَقٌ عَلَيهِ، البُخَارِيُّ برقم: (٢٠٧٨)، وَمسلم برقم: (٣٩٧٤)، وَأَحْمَد برقم: (٨٣٦٩)، وَالنَّسَائِيُّ برقم: (٤٧٠٩))}، واتە: ئەبو هورەیرە خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: پیاوێك هەبوو {واتە: پێش ئوممەتی ئیسلام} قەرزی دەدا بە خەڵك، بە غوڵامەکەی خۆی دەگوت {یانی بەو کەسەی کە لەبەردەستی بوو خزمەتی دەکرد}، ئەگەر چووی بۆ لای بابایەکی قەرزدار کە تەنگ دەستە، چاوپۆشیی لێ بکە، بەڵکو خواش چاوپۆشیی لە ئێمە بکات {واتە: لە هەموو یان بەشێکی قەرزەکەی خۆشبە، بەشکم خواش لە ئێمە خۆشبێ} جا کاتێ گەیشتە خوا لێی خۆشبوو، یانی، وەك چۆن ئەو لەو خەڵکە خۆشبووە لە هەقی خۆی، خوای پەروەردگاریش لە هەقی خۆی خۆشبوو.

**مەسەلەی نۆزدەیەم و کۆتایی:** کە دەفەرموێ: ﴿ وَٱتَّقُواْ يَوۡمٗا تُرۡجَعُونَ فِيهِ إِلَى ٱللَّهِ ﴾، {(عَن ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: آخر شَيءٍ نَزَلَ من القُرْآن: ﴿ وَٱتَّقُواْ يَوۡمٗا تُرۡجَعُونَ فِيهِ إِلَى ٱللَّهِۖ ثُمَّ تُوَفَّىٰ كُلُّ نَفۡسٖ مَّا كَسَبَتۡ وَهُمۡ لَا يُظۡلَمُونَ ٢٨١ ﴾)}[1]

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ: (ئەم ئایەتە قورئانییە) کۆتا شتێکە کە لە قورئان هاتۆتە خوار، هەتا هەندێك گوتوویانە: سێ سەعات پێش وەفاتی پێغەمبەر ﷺ، وە هەندێکیان گوتوویانە: سێ ڕۆژ، هەندێکیان گوتوویانە: چەند مانگێك و لە دوای ئەم ڕستە قورئانییە وەحی دیکە نەهاتوە، دەفەرموێ: ﴿ وَٱتَّقُواْ يَوۡمٗا تُرۡجَعُونَ فِيهِ إِلَى ٱللَّهِۖ ثُمَّ تُوَفَّىٰ كُلُّ نَفۡسٖ مَّا كَسَبَتۡ وَهُمۡ لَا يُظۡلَمُونَ ﴾، وە لە ڕۆژێك پارێزێ بکەن کە تێیدا بۆ لای خوا دەگێڕڕێنەوە، دوایی هەرکەسە بە ئەندازەی کردەوەکانی

---

١) (المِصباحُ المُنير في تَهذيب تَفسير إبن كَثير)، ص: (١٩٩).

خـۆی، سـزا یـان پاداشــت وەردەگرێتـەوە بـێ کـەم و زیـاد، وە سـتەمیـشیان لـێ ناکرێ، ئەمە کۆتـا ڕسـتەیە کـە لـە قورئــان هاتۆتـە خـوارو دوایـین فەرمایـشتی خوایە بۆ ئێمـە.

جا خوای پەروەردگـار لەو کەسـانـەمان بگـێڕێ کە پارێزکاریی دەکەن و خۆیان بـۆ ئەو ڕۆژە ئامادە دەکەن، کە دەچنەوە بەر دادگـای خوای دادگەر، وە بەسەری بـەرزو بەڕووی سوورو دەستی پڕ، دەگەڕێنـەوە بۆ لای خـوا، ئامـیـن.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی پەنجاو حەوتەمین

## پێناسەی ئەم دەرسە

خوا پشتیوان بێ لەم دەرسەماندا دوو ئایەتان دەتوێژینەوە، ئایەتەکانی ژمارە: (٢٨٢و ٢٨٣) لە سووڕەتی (البقرة) کە باسی نووسینی مامەڵەو بازرگانی بە قەرز، وە شایەد لەسەر گرتنیو ڕەهنو ئەو مەسەلەو بابەتانەی کە پێیانەوە پەیوەستن، دەکەنو لە سۆنگەی ئەوەوە کە بابەتو مەسەلەکان زۆرن، لێرە بەم ئاماژە کورتە وازدێنین، هەتا لە بڕگەکانی دیکەدا دەیانتوێژینەوە.

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا تَدَايَنتُم بِدَيۡنٍ إِلَىٰٓ أَجَلٖ مُّسَمّٗى فَٱكۡتُبُوهُۚ وَلۡيَكۡتُب بَّيۡنَكُمۡ كَاتِبُۢ بِٱلۡعَدۡلِۚ وَلَا يَأۡبَ كَاتِبٌ أَن يَكۡتُبَ كَمَا عَلَّمَهُ ٱللَّهُۚ فَلۡيَكۡتُبۡ وَلۡيُمۡلِلِ ٱلَّذِي عَلَيۡهِ ٱلۡحَقُّ وَلۡيَتَّقِ ٱللَّهَ رَبَّهُۥ وَلَا يَبۡخَسۡ مِنۡهُ شَيۡـٔٗاۚ فَإِن كَانَ ٱلَّذِي عَلَيۡهِ ٱلۡحَقُّ سَفِيهًا أَوۡ ضَعِيفًا أَوۡ لَا يَسۡتَطِيعُ أَن يُمِلَّ هُوَ فَلۡيُمۡلِلۡ وَلِيُّهُۥ بِٱلۡعَدۡلِۚ وَٱسۡتَشۡهِدُواْ شَهِيدَيۡنِ مِن رِّجَالِكُمۡۖ فَإِن لَّمۡ يَكُونَا رَجُلَيۡنِ فَرَجُلٞ وَٱمۡرَأَتَانِ مِمَّن تَرۡضَوۡنَ مِنَ ٱلشُّهَدَآءِ أَن تَضِلَّ إِحۡدَىٰهُمَا فَتُذَكِّرَ إِحۡدَىٰهُمَا ٱلۡأُخۡرَىٰۚ وَلَا يَأۡبَ ٱلشُّهَدَآءُ إِذَا مَا دُعُواْۚ وَلَا تَسۡـَٔمُوٓاْ أَن تَكۡتُبُوهُ صَغِيرًا أَوۡ كَبِيرًا إِلَىٰٓ أَجَلِهِۦۚ ذَٰلِكُمۡ أَقۡسَطُ عِندَ ٱللَّهِ وَأَقۡوَمُ لِلشَّهَٰدَةِ وَأَدۡنَىٰٓ أَلَّا تَرۡتَابُوٓاْ إِلَّآ أَن تَكُونَ تِجَٰرَةً حَاضِرَةٗ تُدِيرُونَهَا بَيۡنَكُمۡ فَلَيۡسَ عَلَيۡكُمۡ جُنَاحٌ أَلَّا تَكۡتُبُوهَاۗ وَأَشۡهِدُوٓاْ إِذَا تَبَايَعۡتُمۡۚ وَلَا يُضَآرَّ كَاتِبٞ وَلَا شَهِيدٞۚ وَإِن تَفۡعَلُواْ فَإِنَّهُۥ فُسُوقُۢ بِكُمۡۗ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۖ

وَيُعَلِّمُكُمُ ٱللَّهُ ۗ وَٱللَّهُ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ ﴿٢٨٢﴾ وَإِن كُنتُمْ عَلَىٰ سَفَرٍ وَلَمْ تَجِدُوا۟ كَاتِبًا فَرِهَـٰنٌ مَّقْبُوضَةٌ ۖ فَإِنْ أَمِنَ بَعْضُكُم بَعْضًا فَلْيُؤَدِّ ٱلَّذِى ٱؤْتُمِنَ أَمَـٰنَتَهُۥ وَلْيَتَّقِ ٱللَّهَ رَبَّهُۥ ۗ وَلَا تَكْتُمُوا۟ ٱلشَّهَـٰدَةَ ۚ وَمَن يَكْتُمْهَا فَإِنَّهُۥٓ ءَاثِمٌ قَلْبُهُۥ ۗ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ عَلِيمٌ ﴿٢٨٣﴾ ﴾.

## مانای وشە بە وشەی ئایەتەكان

((ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! هەركات مامەڵەیەكی قەرزتان بۆ كاتێكی دیاریكراو لەگەڵ یەكدیدا كرد، بینووسن! وە با نووسەرێك دادگەرانە لە نێوانتاندا بینووسێ، وە با هیچ نووسەرێك لاملیی نەكات كە بینووسێ، وەك چۆن خوا فێری كردوە، بەڵكو با بینووسێ، وە با ئەو كەسەی كە هەقەكەی لەلایە دەریببڕێ (دانی پێدا بێنێ)، وە با پارێز لە پەروەردگاری بكاتو هیچ شتێكی لێ كەم نەكاتەوە (لەوەی كە بەقەرز وەریدەگرێ)، ئنجا ئەگەر ئەو كەسە كە هەقەكەی لەلایە نەفام بوو، یان بێهێز بوو، یان ئەو نەیدەتوانی دەریببڕێ، با سەرپەرشتیارەكەی دادگەرانە بیڵێ (دەریببڕێ)، وە دوو شایەد لە پیاوانتان بە شایەد بگرن، وە ئەگەر دوو پیاو نەبوون، با پیاوێكو دوو ئافرەت بن، لەو شایەدانەی كە پێتان پەسندن (و متمانەتان پێیان هەیە) تاكو ئەگەر یەكیان هەڵەی كرد (لەو دوو ئافرەتانە) یەكیان وەبیر ئەوی دیكە بێنێتەوە، وە با شایەدەكان هەر كات بانگكران (بۆ شایەدییدان) لاملیی نەكەن، وە لە نووسینی (قەرز) بێزار مەبن گچكە، بێ یان گەورە (واتە: كەم بێ یا زۆر) هەتا كاتی دیاریكراوی، ئا ئەوەتان لەلای خوا دادگەرانەترە، بۆ شایەدییدان ڕاستترە، لە نەكەوتنە دوو دڵییشتان نیزیكترە، مەگەر (مامەڵەكەتان) بازرگانییەكی دەستبەجێ بێ، كە لەنێو خۆتاندا ئەنجامی بدەن، ئەو كاتە گوناهتان ناگات كە نەینووسن، بەڵام هەركات كڕینو فرۆشتنتان كرد، شایەد بگرن، وە با هیچ نووسەرێكو هیچ شایەدێك تووشی زیان نەكرێن، (یان زیان لە خاوەن ماڵ، یان قەرزدارەكە نەدەن)، وە ئەگەر وابكەن، ئەوە

دووچاری لارێبوون دەبن، وە پارێز لە خوا بکەن، وە خوا فێرتان دەکات، وە خوا بە هەموو شتێك زانایە ﴿٢٨٢﴾ وە ئەگەر لە سەفەرێ بوون‌و نووسەرتان چنگ نەکەوت، با (دەستەبەرکەری نەفەوتانی قەرزەکانتان) بارمتە وەرگیراوەکان بن، جا هەرکات هەندێکتان لە هەندێکتان دڵنیابوون (کە قەرزەکە نافەوتێنێ‌و بەبێ نووسین‌و شایەدگرتن‌و بارمتە، قەرزتاندا) با ئەو کەسەی کە بە ئەمیندار دانراوە، سپاردەکە بداتەوە، وە با پارێز لە خوای پەروەردگاری بکات، وە شایەدییدان مەشارنەوەو هەرکەس بیشارێتەوە، ئەوە دڵی گوناهبارە، وە خوا بەوەی دەیکەن زانایە ﴿٢٨٣﴾)).

## شیکردنەوەی هەندێك لە وشەکان

(**بِدَيْنٍ**): واتە: قەرز لە زمانی عەرەبیدا دەڵێ: (دِنْتُ الرَّجُلَ: أخَذتُ مِنهُ دَيْناً وَأدَنْتُهُ: جَعَلْتُهُ دَائِناً وذلِكَ بِأنَّ تُعطِيَهُ دَيْناً)، (دِنْتُ الرَّجُلَ) واتە: قەرزم لە پیاوەکە وەرگرت، وە (وأدَنْتُهُ) واتە: قەرزم پێداو کردم بە قەرزدار.

(**وَلْيُمْلِلِ**): (أَمْلَى) واتە: خوێندیەوە بەسەر نووسەرێکدا کە بینووسێ (إِمْلاءٌ) واتە: بەسەردا خوێندنەوە (ولْيُمْلِلِ) واتە: با بخوێنێتەوەو بڵێ: ئەو ئەندازەیەم لە فلان رۆژ لە فلان کەس وەرگرت، نووسەرێکیش بینووسێ‌و دوو شایەدیش شایەدیی بدەن، دەگوترێ: (أمْلَلتُ وأملَيْتُ: تَلَوتُ وَقُلْتُ) واتە: خوێندمەوەو گوتم.

(**وَلَا يَبْخَسْ**): (البُخسُ: نَقْصُ الشَّيءِ عَلَى سَبِيلِ الظُلْمِ)، (بَخْسٌ) بریتیە لە کەمکردنەوەی شتێك بە شێوەیەکی ستەمکارانە، کەواتە: مەبەست ئەوەیە ئەو کەسە کە قەرزەکەی دەکەوێتە سەر، کاتێك کە دەیڵێ بۆ ئەوە بنووسرێ، با هیچی لێ کەم نەکاتەوە، دەبینی کابرای خاوەن قەرز لەوێ نابێ، بڵێ: ئەوەندەی پێنەدام‌و کەمتری پێدام.

(**سَفِيهًا**): وشەی (سَفِيه) یانی: نەفام، عەقڵ سووك، دەڵێ: (السَّفَهُ: خِفَّةٌ فـي البَدَنِ، وَاسْتُعْمِلَ فـي خِفَةِ النَّفْسِ لِنُقصانِ العَقْلِ..) لە ئەسڵدا (سَفَه) واتە: قالب سووکیی، دوایی بەکارهێنراوە بۆ سووکیی نەفس لەبەر کەمیی عەقڵ،

ئێستا لە عەرەبیدا بە هەرکەسێك بڵێی: (سَفِیه) زەینیان بۆ لای مانا ئەسڵیەکەی هەر ناچێ،کە مەبەست ئەوەیە بەدەنی سووکەو لاوازە، بەڵکو هەر یەکسەر ئەو مانایەی کە بۆی خوازراوەتەوە، کە بریتییە لە عەقڵ سووکیی ئەو مانایە دێتە زەینەوەو، لێرەشدا مەبەست هەرئەوەیە واتە: گێلو عەقڵ سووك.

(أَن تَضِلَّ )، واتە: ئەگەر لێی هەڵە بوو، یان لە بیری چوو، چونکە (الضَّلاَل: العُدُولُ عَن الصِراطَ المُستَقیم)، واتە: (ضَلال) بریتیە لە لادان لە ڕێی ڕاست، ئەوە واتایەکی، واتایەکی دی: (ضَلَّ عَنْهُ الشَّيءُ ضَاعَ مِنهُ وَ فُقِدَ) واتە: شتەکەی لێ ونبوو، لێی بزر بوو.

(ٱلشُّهَدَآءِ )، (شُهَدَاء) کۆی (شَاهِد)ە واتە: شایەدەکان، شایەد کێیە ؟ دەڵێ: (الشُّهُودُ و الشهَادَةُ: الحضُورُ مَعَ المُشاهَدَة، إمَا بالبَصَرِ، أو بالبَصِیرَةِ، یُقَالُ شَهِدتُ كَذَا وشَهِدتُ عَلَیهِ)، (شُهُود وشَهَادَة): بریتیە لە ئامادەبوون لەگەڵ بینیندا، چ بە چاو، چ بە عەقڵ، دەڵێ: (شَهِدتُ كَذَا) واتە: بینیم، یان (شَهِدتُ عَلَیهِ) واتە: شایەد بووم لەسەری، ئنجا بۆچی بە کەسێك کە شایەدیی دەدا بۆ کەسێك، گوتراوە شایەد ؟ چونکە دەبێ شتەکە بزانێو وەك بە چاوی خۆی بیبینێ ئاوا یەقینی هەبێ، ئنجا شایەدیی بدات.

(وَلَا تَسْـَٔمُوٓاْ)، واتە: ماندوو مەبن، (السآمَةُ: المَلالَةُ مِمَّا یَكْثُرُ لُبْثُهُ، فِعْلاً كَانَ أو انفِعَالاً)، (السآمة)، (المَلالَة) واتە: ماندووبوون، بەهۆی زۆر مانەوەوە، کار بێ، یان کارتێکران، (وَلَا تَسْـَٔمُوٓاْ) یانی: ماندوو مەبن لە نووسینی، گچکە بێ، یان گەورە بێ، قەرزەکە کەم بێ، یان زۆر بێ، بینووسن باشترە.

(أَقْسَطُ)، واتە: دادگەرانەترە، (القِسْطُ: هُوَ النَّصِیبُ بالعَدْلِ كَالنَّصَفِ، والنَّصَفَةِ وَالقَسْطُ أخذَ قِسطُ الغَیرِ)، (قِسْط): بریتیە لە بەشێك کە بە دادگەرانە بەشکرا بێ، وە (قَسْط)یش بریتیە لە وەرگرتنی بەشی یەکێکی دیکە (إقْسَاط) واتە: دادگەریی، (مُقْسِط) واتە: دادگەر، بەڵام (قاسِط) یانی: ستەمکار، (قاسِط) ئەو کەسەیە کە بەشی خەڵکی بۆخۆی وەرگرتبێو

(مُقْسِط) ئەو کەسەیە کە بەشی خەڵکی دابێ بە دادگەرانە.

(وَأَقْوَمُ)؛ واتە: ڕاستترو گونجاوترە.

(تِجَـٰرَةً)؛ واتە: بازرگانیی، (التِجَارَةُ: التَصَرُّفُ فِي رَأسِ المالِ طَلَباً لِلربحِ) بازرگانیی بریتیە لە دەست وەردان لە دەستمایەو کارپێکردنی بە مەبەستی وەدەستهێنانی قازانج.

(حَاضِرَةً)؛ واتە: ئامادە، ئەو بازرگانییەی دەستاودەستەو دەستبەجێ ئەنجام دەدرێ، پێویستی بە نووسەرو نووسینو ئەوانە ناکات، بەڵام شایەد هەبن هەر باشترە بۆئەوەی دوایی یەکێکیان پەشیمان نەبێتەوە، (الحَضَرُ خِلافُ البَدوِ، والحَضارَةُ والحِضارَةُ: السّكونُ بالحَضَرِ (تِجارَةٌ حاضِرة): أي نَقْداً)، (حَضَرْ) پێچەوانەی (بَدْو)ە، (بَدو) واتە: بیابانشین، (حَضَرْ) واتە: نیشتەجێ، وە (حَضَارة) ئەوەیە کە شوێنێك ئاوەدان کرابێتەوەو خەڵك لێی نیشتەجێ بووبێ.

(جُنَاحٌ)؛ (جُناح) گوناحی کوردەواریی خۆمان هەر لە (جُناح)ەوە هاتوە، جا (جُناح) ئەسڵی لە (جَنَاحْ)ەوە هاتوە، (جَنَاح)یش واتە: باڵ، وە دەگوترێ: (جَنَحَتِ السَفِينَةُ إذَا مَالَت) ئەگەر کەشتییەك بە لایەکیدا کەوت، دەڵێن: (جَنَحَتِ) واتە: بەلایەکدا کەوت، لەبەرئەوە کە کابرا وەختێك بەلایەکدا لادەدا، مانای وایە تووشی گوناح بووە، بۆیە ناو لەو گوناحو هەڵەیە نراوە (جُناح).

(فَرِهَٰنٌ)؛ (رِهَان) کۆی (رَهْن)ە، (الرَّهْنُ: ما يُوضَعُ وَثِيقَةً لِلدَّينِ)، (رَهْن) واتە: بارمتە، هەر شتێك کە وەردەگیرێ وەك بارمتەیەك لەجیاتی قەرز، بۆ وێنە: کابرا سەد ملیۆن دینار دەدا بە کەسێك دەڵێ: تۆش ئەو سەیارەت هەیە لە ڕەهنی مندا دایبنێو با سەیارەکەتم لەلابێ، هەرکاتێ پارەکەت بۆ هێنامەوە سەیارەکەت پێدەدەمەوە، کە دوایی زیاتر باسی دەکەین.

(أَمِنَ)؛ واتە: لێی دڵنیابوو، (أمِنَهُ: وَثِقَ بِهِ وَاعتَبَرَهُ أميناً ذَا أمانَةٍ) ﴿فَإِنْ أَمِنَ بَعْضُكُم بَعْضًا﴾، واتە: ئەگەر هەندێکتان لە هەندێکتان دڵنیابوون، کە

خیانەتی لێ ناکاتو قەرزەکەی دەداتەوە، واتە: متمانەی پێ بووو بە ئەمینداری دانا.

**(فَلْيُؤَدِّ)**: (أدَّى الشَيءَ: أقامَ بِهِ) شتەکەی جێبەجێ کرد، (وَأدَّى الدَّينَ: قَضاهُ)، قەرزەکەی دایەوە (وَأدَّى الصَّلاةَ: قَامَ بِها لِوَقتِها) لە کاتی خۆیدا نوێژەکەی جێبەجێ کرد (وَأدَّى إلَيهِ الشَّيءَ: أَوْصَلَهُ إليهِ) شتەکەی گەیاندە دەستی، کەواتە: ﴿ فَلْيُؤَدِّ ٱلَّذِى ٱؤْتُمِنَ أَمَٰنَتَهُۥ ﴾، یانی: ئەو کەسەی کە شتێکی بە ئەمانەت لەلادانراوە، با بیگەیەنێتەوە خاوەنەکەی، واتە: ئەو قەرزەی کە لەلایەتی، با بە ئەمانەتێکی دابنێو بۆ خاوەنەکەی بگێڕێتەوە.

**(وَلَا تَكْتُمُوا۟ ٱلشَّهَٰدَةَ )**: (الكِتْمَانُ: سَتْرُ الحَدِيثِ)، (کتمان) ئەوەیە قسەیەك بشاریەوە، ﴿ وَلَا تَكْتُمُوا۟ ٱلشَّهَٰدَةَ ﴾، شایەدییدان مەشارنەوە.

## مانای گشتی ئایەتەکان

ئەم دوو ئایەتە موبارەکە کە یەکێکیان باسی قەرزو ئەوی دیکەیان باسی ڕەهن دەکات، خوا ﷻ ڕوو لە ئەهلی ئیمان دەکاتو لێرەدا بۆیان باسی قەرز پێدان دەکات، بۆ زانیاریتان ئەم ئایەتە درێژترین ئایەتە لە قورئاندا، واتە: سووڕەتی (البقرة) گەورەترین ئایەتی قورئانی تێدایە، لە ڕووی پلەو پایەوە کە (آیة الكُرسي)یە، وە درێژترین ئایەتیشی تێدایە لەڕووی قەبارەوە، کە ئایەتی قەرز (آیة الدَّین)ە، دیارە ئەوەش جێی سەرنجە، کە گەورەترین ئایەتی قورئان باسی خوای پەروەردگار دەکاتو، درێژترین ئایەتیش باسی لایەنی ئابووریی‌و ماڵو سامان دەکات، ئەوە گرنگیی پێدانی ئیسلامو قورئان دەگەیەنێ، بە بابەتی ئابووریی‌و ماڵو سامان، خوا دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِذَا تَدَايَنتُم بِدَيْنٍ إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى فَٱكْتُبُوهُ ﴾، واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! هەر کات قەرزتاندا لەنێو خۆتاندا بە یەکدیدا، یاخود مامەڵەیەکی بە قەرزتان لەگەڵ یەکدیدا کرد بۆ

کاتێکی دیاریکراو، بینووسن، دیارە ئێمە دوایی لە خستنەڕووی مەسەلە گرنگەکاندا وردتر دێینە سەر باسی ئەوە کە ئایا ئەو نووسینە فەڕزە یان سوننەتە ؟ هەروەها سەرجەم مەسەلەکانی دیکەش، وە ئێستا هەر بە کورتی مانای ئایەتەکان دەکەین ﴿ وَلْيَكْتُب بَّيْنَكُمْ كَاتِبٌ بِٱلْعَدْلِ ﴾، وە با نووسەرێك دادگەرانە لە نێوانتاندا بینووسێ، واتە: نە بەلای بابای پارەداردا بچێ، نە بەلای بابای پارە وەرگر، نە بەلای خاوەن قەرزو نە بەلای قەرزداردا، بەلای کەسدا نەیشکێنێتەوەو چۆنە وایبنووسێ ﴿ وَلَا يَأْبَ كَاتِبٌ أَن يَكْتُبَ كَمَا عَلَّمَهُ ٱللَّهُ ﴾، وە با هیچ نووسەرێك لاملیی نەکات لەوە، کە وەك چۆن خوا فێری کردوە بینووسێ، یانی: وەك چۆن خوا ئەو چاکەیەی لەگەڵ ئەودا کردوەو فێری خوێندنو نووسینی کردوە، با ئەویش وەك سوپاسگوزاریی ئەو نیعمەتە، ئەگەر سەریان تێیوەستا لە شوێنێكو بێجگە لەو کەسیان دەست نەکەوت، با بینووسێو خۆیان لێ نەخاتە سەرپشتو بیانوویان پێنەگرێ ﴿ فَلْيَكْتُبْ ﴾، با بینووسێ، تەئکید دەکاتەوە ﴿ وَلْيُمْلِلِ ٱلَّذِى عَلَيْهِ ٱلْحَقُّ ﴾، ئایا کێ دان بە قەرزەکەدا بێنێ ؟ بێگومان ئەو کەسەی کە هەقەکەی لەلایە، ئەوەی پارەکە وەردەگرێ، قەرزدارەکە، با ئەو بیڵێ، بۆچی ؟ ئەگەر ئەوی دیکەبێ کە خاوەن قەرزە، دوایی بابای قەرزدار بۆی هەیە بڵێ: تۆ بە کەیفی خۆت گوتووتە، بەڵام ئەگەر بۆخۆی بیڵێ: پێی دەگوترێ: تۆ بەزاری خۆت دانت پێهێناوە ! مانای وایە ئەو کاتە هیچ ئیشکالی تێدا نابێ ﴿ وَلْيَتَّقِ ٱللَّهَ رَبَّهُۥ ﴾، وە با پارێزیش لە پەروەردگاری خۆی بکات ﴿ وَلَا يَبْخَسْ مِنْهُ شَيْـًٔا ﴾، وە هیچی لێ کەم نەکاتەوە، ئەو قەرزە کە وەریگرتوە، چەندەو چی لەلایە با هەمووی دان پێدابێنێ، بۆ ئەوەی نووسەرەکەش وەك ئەو دانی پێدادێنێ، ئاوا بینووسێ ﴿ فَإِن كَانَ ٱلَّذِى عَلَيْهِ ٱلْحَقُّ سَفِيهًا أَوْ ضَعِيفًا أَوْ لَا يَسْتَطِيعُ أَن يُمِلَّ هُوَ فَلْيُمْلِلْ وَلِيُّهُۥ بِٱلْعَدْلِ ﴾، ئەگەر ئەوەی هەقەکەی لەسەرە گێلو نەفام بوو، یان بێهێز بوو، یاخود

نەیدەتوانی، بۆ وێنە:لاڵ بوو، یاخود سەری لێ دەرنەدەچوو، با سەرپەرشتیارەکەی بە شێوەیەکی دادگەرانە بیڵێ‌و بیخوێنێتەوە، بۆ ئەوەی بەو جۆرە بنووسرێ کە ڕاستو دادگەرییە، ﴿ وَٱسْتَشْهِدُوا۟ شَهِيدَيْنِ مِن رِّجَالِكُمْ ﴾، بەڵام خوای کاربەجێ تەنیا بە نووسین لێی نەگەڕاوەو فەرموویەتی: ئنجا دوو پیاوانیش لە خۆتان بکەن بە شایەد لەسەری ﴿ فَإِن لَّمْ يَكُونَا رَجُلَيْنِ ﴾، جا ئەگەر دوو پیاوتان چنگ نەکەوتن ﴿ فَرَجُلٌ وَٱمْرَأَتَانِ ﴾، با پیاوێك‌و دوو ئافرەت بن ﴿ مِمَّن تَرْضَوْنَ مِنَ ٱلشُّهَدَآءِ ﴾، لەو شایەدانەی کە لێیان ڕازیین‌و متمانەتان پێیان هەیەو بە پەسندیان دەزانن، چونکە کەسێك متمانەی بە کەسێك نەبێ بە شایەدی ناگرێ، ئنجا ئایا حیکمەتی ئەوە چییە کە دوو ئافرەت لەجیاتی پیاوێکن بۆ شایەدیی ؟ خوای کاربەجێ حیکمەتەکەی ڕوون دەکاتەوە، وە بۆ زانیاریتان خوا ﷻ، مەگەر چۆن ئەگەرنا هیچ یاسایەکی شەرعیی نەفەرمووە لەم قورئانەدا، مەگەر ئاماژەی بە حیکمەتەکەی کردوە، چونکە ئەسڵ لە مامەڵەکردندا ئەوەیە کە هەموو شتێك حیکمەتەکەی‌و هۆیەکەی دیاربێ، بە پێچەوانەی عیبادەتەوە کە ئێمە بە دوای حیکمەتیدا ناگەڕێین، بۆ وێنە: خوا فەرموویەتی: نوێژی شێوان سێ ڕکاتە، بۆچی سێ ڕکاتە ؟ ئەدی بەیانی بۆچی دوو ڕکاتە ؟ نیوەڕۆ بۆچی چوار ڕکاتە ؟ ئەوە مامەڵەکردنە لەگەڵ خواداو نابێ لە حیکمەتەکەی بکۆڵینەوە، خوا دەفەرموێ: ئاوا بمپەرستە، خواپەرستیی (عبادة)یش واتە: ئەوپەڕی ملکەچیی، جا کەسێ بۆ خوا ئەوپەڕی ملکەچ بێ، ناچێ بڵێ: بۆچی وا بکەم‌و، بۆچی وا نەکەم ؟! بەڵام مامەڵەکردنی ئێمە لەنێو خۆماندا سەرمان لێ دەردەچێ، بۆچی وابێ‌و بۆچی وانەبێ ؟ بۆیە خوا ﷻ هەرچەندە بۆ عیبادەتەکانیش کەم‌و زۆر ئاماژە دەکات بە حیکمەتەکانی، بەڵام هی هەڵسوکەوتەکان‌و مامەڵە، مەگەر چۆن ئەگەرنا حیکمەتەکانی بەیان دەکات، لێرەدا کە دەفەرموێ: ﴿ أَن تَضِلَّ إِحْدَىٰهُمَا فَتُذَكِّرَ إِحْدَىٰهُمَا ٱلْأُخْرَىٰ ﴾، زانیویەتی پرسیارێك دروست دەبێ، باشە بۆچی دوو ئافرەت

لەجیاتی پیاوێك بۆ شایەدییدان لەسەر قەرز ؟ دەفەرموێ: بۆ ئەوەی ئەگەر یەكێكیان لێی تێكچوو ئەوی دیكە بەبیری بێنێتەوە، ئافرەت بەهۆی كەوتنە حەیزەوە، بەهۆی زەیستانییەوەو بەهۆی حاڵەتی عاتیفیی یەوە كە هەیەتی، ئەویش خوای كاربەجێ بۆیە وای دروست كردوە، تاكو بتوانێ منداڵ بەخێو بكات و ئەركی دایكایەتی ببینێ، وە بەهۆی ئەوەوە كە ئافرەت بەزۆری لە چوارچێوەی خێزانـدا دەژیو، لەگەڵ ئیشوكاری ماڵدا مامەڵە دەكات، نەك لەگەڵ بازاڕو بازرگانیی، تەماشای هەموو دنیا بكەن نەك هەر لە جیهانی ئیسلامییدا چەند ئافرەت بازرگانن ؟ زۆر بە كەمیی، یان چەند ئافرەت سیاسیین ؟ چەند ئافرەت فەیلەسووفن ؟ چەند ئافرەت فەرماندەی جەنگن ؟ یان هەر نین، یان زۆر بە دەگمەن، كەواتە: بازرگانیی مەیدانی ئافرەتان نیە، بۆیە تێیدا كارامەو شارەزانین و، لەو بوارەدا توانای زەبت و كۆنترۆڵكردنی زانیاری و ئامارەكانیان كەمە، بۆیە پێویستە دوو ئافرەت بن تاكو یەكێكیان وەبیر ئەوی دیكە بێنێتەوەو، بە هەردووكیان یەكدی بەهێز بكەن، بۆچی ؟ بۆئەوەی ماڵی خەڵك نەفەوتێ، كەواتە: مەسەلە بە كەم تەماشاكردنی ئافرەت نیە، بەڵكو بە هەند هەڵگرتنی ماڵ و سامانی خەڵكە كە نەفەوتێ، لە حاڵێكدا كە دوو پیاو چنگ ناكەون بۆ شایەدیی، با پیاوێك و دوو ئافرەت بن، بۆ ئەوەی كە وەبیری یەكدی بخەنەوە ﴿ وَلَا يَأْبَ ٱلشُّهَدَآءُ إِذَا مَا دُعُواْ ﴾، با شایەدەكان كە بانگكران بۆ ئەوەی شایەدیی بدەن، لاملیی و سەرپێچیی نەكەن، بڕو بیانوو نەهێننەوەو بێن. ﴿ وَلَا تَسْـَٔمُوٓاْ أَن تَكْتُبُوهُ صَغِيرًا أَوْ كَبِيرًا إِلَىٰٓ أَجَلِهِۦ ﴾، وە ئێوە ماندوو مەبن كە قەرزەكە بنووسن، گچكەبێ یان گەورەبێ، واتە: كەمبێ یان زۆربێ، بۆ كاتی دیاریكراوی خۆی (بینووسن و مەیكەنە تەنبەڵیی).

ئنجا سێ حیكمەتی تێدا دەخاتە ڕوو: ﴿ ذَٰلِكُمْ أَقْسَطُ عِندَ ٱللَّهِ وَأَقْوَمُ لِلشَّهَٰدَةِ وَأَدْنَىٰٓ أَلَّا تَرْتَابُوٓاْ ﴾:

١- ﴿ ذَٰلِكُمْ أَقْسَطُ عِندَ ٱللَّهِ ﴾، ئەو نووسینە، هەروەها ئەو شایەدگرتنەتان لە لای خوا، دادگەرانەترەو دووردەبێ لە ستەمو دوایی دەمەقاڵێی لەسەر پەیدانابێ، تۆ بڵێی: ئەوەندە بوو ئەو بڵێ: نەخێر ئەوەندە نەبوو، ئەگەر نووسرابێو شایەد هەبن، جێگای مشتومڕ نابێ چونکە کەسانێك هەن دەیانەوێ ماڵی خەڵکی بە ناهەق بخۆن، جا چ خاوەن قەرزەکە بێ، بۆ وێنە: پەنجا ملیۆنی داوەتێ، دەڵێ: سەد ملیۆن بوو، وە چ قەرز وەرگرەکە بێ (قەرزدارەکە) بڵێ: تەنیا پەنجا ملیۆن بوو لەکاتێك کە قەرزەکە سەد بووە، ئەو کەسانە هەر دەبن لەنێو کۆمەڵگادا، کەواتە: دەبێ بنووسرێو شایەد هەبن، مانای وایە ئەوکاتە بە دوو شتان بەستراوەتەوەو، مشتومڕو ناکۆکییو سەرەنجام ستەم ڕوونادات.

٢- ﴿ وَأَقْوَمُ لِلشَّهَٰدَةِ ﴾، وە ئەوە ڕاستترە بۆ شایەدییدان، چونکە نووسینەکە قسەی شایەدەکان بەهێز دەکاتو بۆیان دەبێتە دیکۆمێنت (وثیقة).

٣- ﴿ وَأَدْنَىٰٓ أَلَّا تَرْتَابُوٓا۟ ﴾، وە بۆ ئێوەش نزیکترە لەوەی کە نەکەونە گومانەوە، ئەگەرنا مرۆڤ بۆی هەیە لە خاوەن پارە بکەوێتە گومان، تۆ بڵێی بەڕاستی بێ ! لەوانەیە زوڵم لەو هەژارە بکات، یان بۆی هەیە لەوی دیکە بکەوێتە گومان، تۆ بڵێی بە ڕاستی بێ ! بەڵام ئەگەر شایەد هەبێو نووسرابێ، مشتومڕ دروست نابێو ناکەونە گومانەوە.

ئنجا خوا ﷻ یەك حاڵەتی لێ هەڵداوێرێ، چونکە خوای زاناو شارەزا کە کاربەجێیە، دەزانێ ژیانی ئێمە چۆنە؟ ﴿ إِلَّآ أَن تَكُونَ تِجَٰرَةً حَاضِرَةً تُدِيرُونَهَا بَيْنَكُمْ ﴾، لە یەك حاڵدا قەیناکات ئەگەر نەینووسن: ئەگەر بازرگانییەکی ئامادەی دەستبەدەست بێ، لەنێو خۆتاندا کە هەڵی دەسووڕێنن ﴿ فَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَلَّا تَكْتُبُوهَا ﴾، لەو حاڵەتەدا گوناحتان ناگاتێ کە نەینووسن، دەڵێی: ئەرێ ئەو کراسە بە چەندە ؟ دەڵێ: بەوەندەیە، پێویست ناکات بڵێی: وەرە نووسەرێکی

بێنە با بینووسێ! ﴿ وَأَشْهِدُوٓاْ إِذَا تَبَايَعْتُمْ ﴾، وە شایەد بگرن ئەگەر کڕین‌و فرۆشتنتان کرد، هەڵبەتە شەرعزانان‌و توێژەرەوان دەڵێن: ئەوە مەبەست پێی کڕین‌و فرۆشتنی گەورەیە، بۆ وێنە: کابرا بایی یەك ملیۆن دەستبەجێ شتێك دەکڕێ، وا باشە شایەد هەبێ، ئەگەرنا شتێك کە بچووکە، دەچی کیلۆ تەماتەیەکی دەکڕی، پێویست ناکات دوو شایەدان بانگ بکەی: وەرن شایەد بن من ئەو کیلۆ تەماتەیەم بەوەندەی کڕیوە! کەس‌شتی وا ناکات، ﴿ وَلَا يُضَآرَّ كَاتِبٌ وَلَا شَهِيدٌ ﴾، وە با هیچ نووسەرێك‌و هیچ شایەدێك زەرەر نەگەیەنێ، نە بە بابای خاوەن پارە، نە بە بابای قەرزدار، یانی بە هیچ کام لەو دوو تەرەفەی کە بازرگانی پێکەوە دەکەن ئەمە واتایەکیەتی.

واتایەکی دیکەی: با هیچ نووسەرێك‌و هیچ شایەدێك زەرەریان پێ نەگەیەنرێ، نووسەرەکە کاتێك بانگ دەکرێ کە دەرفەتی نیە، وە شایەدەکە با هەڵنەپێچرێ، کاتێك کە دەرفەتی نیە، ئەو دوو مانایەش بەمجۆرە وەردەگیرێت ئەگەر (لا يُضَآرَّ) لە (لا يُضَارَرْ)ەوە هاتبێ واتە: (بنا مَجْهُول) یانی: با نووسەرەکەو شایەدەکە زەرەریان پێ نەگەیەنرێ، وەئەگەر (لا يُضَارِرْ) بێ، واتە: با نووسەرەکەو شایەدەکە زەرەر نەدەن لەو خەڵکە ﴿ وَإِن تَفْعَلُواْ ﴾، وە ئەگەر وابکەن، واتە: ئەگەر زەرەر بدەن، چ نووسەرەکە، چ شایەدەکە، چ ئەوانەی دیکە زەرەر لەوان بدەن ﴿ فَإِنَّهُۥ فُسُوقٌۢ بِكُمْ ﴾، ئەوە لا ڕێی‌یەکە پێتانەوە دەنووسێ (وەك چەسپی دوو قل) ﴿ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَيُعَلِّمُكُمُ ٱللَّهُ ﴾، وە پارێز لە خوا بکەن، وە خوا فێرتان دەکات، (ئاوا یاساکانی خۆیتان فێر دەکات) ﴿ وَٱللَّهُ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ ﴾، وە خوا بە هەموو شتێك زانایە.

ئەوە هەمووی لەحاڵێکدا کە خەڵك نیشتەجێیەو لە ماڵێیە، ئەدی ئەگەر لە سەفەرێ بوون‌و پێویستیشیان بە قەرز بوو؟ ئەمجارە باسی ئەو حاڵەتەش دەکات‌و دەفەرموێ: ﴿ وَإِن كُنتُمْ عَلَىٰ سَفَرٍ وَلَمْ تَجِدُواْ كَاتِبًا فَرِهَٰنٌ مَّقْبُوضَةٌ ﴾، وە ئەگەر

لە سەفەرێ بوونو نووسەرێکتان دەست نەکەوت (یان قەڵەمو کاغەزی لێ نەبوو، یان نەدەگونجا بنووسرێ) ﴿ فَرِهَٰنٌ مَّقۡبُوضَةٌ ﴾، (رِهان) کۆی (رَهْن)ە، واتە: بارمتە، با چەند بارمتەیەکی وەرگیراو لەجیاتی نووسینو شایەدی گرتن بێ، {قەرزکەر دەڵێ: ئەوەندە پارەیەم بدەیە بە قەرز، ئەویش دەڵێ: تۆش ئەو شتەم وێدە با بارمتە (رَهن)بێ، لەلام، چونکە دەرفەت نیە بنووسرێ لە نێوانماندا، با شتێکی تۆ لای من بێ، هەرکات پارەکەت هێنا دەتدەمەوە} ﴿ فَإِنۡ أَمِنَ بَعۡضُكُم بَعۡضٗا ﴾، جا ئەگەر هەندێکتان لە هەندێکتان دڵنیابوونو بە ئەمیندارتان دانان ﴿ فَلۡيُؤَدِّ ٱلَّذِي ٱؤۡتُمِنَ أَمَٰنَتَهُۥ ﴾، با ئەو کەسەی کە بە ئەمیندار دانراوە، ئەو سپاردەیەی کە لە لایەتی (کە قەرزەکەیە)، بیگێڕێتەوە بۆ خاوەنەکەی ﴿ وَلۡيَتَّقِ ٱللَّهَ رَبَّهُۥ ﴾، وە با پارێز لە پەروەردگاری بکات، کەواتە: فەرز نیە لە سەفەرێش ئەگەر نووسەر نەبووو قەرزەکە نەنووسرا، حەتمەن بارمتە وەربگیرێ، بەڵکو مۆڵەتە، یان وا پەسندە، ئەگەرنا مادام خەڵکەکە متمانەیان بە یەکدی هەبێ، دەتوانن ئەوە نەکەنو لەسەر بناغەی باوەڕو متمانە بە یەکدیکردن، پێکەوە مامەڵە بکەن ﴿ وَلَا تَكۡتُمُواْ ٱلشَّهَٰدَةَ ﴾، وە شایەدییدان مەشارنەوە، چ ئەوەی کە لە لایەتی، چ ئەوەی کە لە لای دراوە[1]، با شایەدییەکە نەشارێتەوە ﴿ وَمَن يَكۡتُمۡهَا فَإِنَّهُۥٓ ءَاثِمٞ قَلۡبُهُۥ ﴾، وە هەرکەسێکیش شایەدیی بشارێتەوە، ئەوە دڵی گوناهبارە، بۆچی دڵی گوناهبارە ؟ چونکە دڵی ئینسان سەرچاوەی پارێزکاریی (تَقْوى)یەو سەرچاوەی گوناهباریی (فُجُورْ)یشەو لە ڕاستیدا بناغەو بنەڕەتی بەرەو چاکە چوونو بەرەو خراپە چوونی ئینسان لێرەوەیە، بۆیە پێغەمبەریش ﷺ وەك لە فەرموودەی (صَحيح)دا هاتوە سێ جار ئاماژەی بە سینەی موبارەکی کردوەو

---

١) واتە: چ ئەو کەسەی کە شایەدییەکەی لەلایەو، چ ئەو کەسەی کە شایەدییەکەی لەلا دراوەو لێی ئاگادارە.

فەرموویەتی:[١] {(التَّقْوَى هَاهُنَا، التَّقْوَى هَاهُنَا، التَّقْوَى هَاهُنَا)} واتە: تەقوا لێرەدایە، تەقوا لێرەدایە، تەقوا لێرەدایە، یانی: ڕیشەکەی لێرەوەیەو بناغەکەی لێرەوەیە، ئەگەرنا شوێنەواری تەقوا لەسەر ڕواڵەتی ئینسانیش دەردەکەوێ، بەڵام سەرچاوەکەی لێرەوەیە، هەروەك سەرچاوەی گوناحیش هەر لێرەوەیە ﴿وَٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ عَلِيمٌ﴾، وەخوا بەوەی کە دەیکەن زانایەو ئاگاداری هەموو شتێکە، کەواتە: بزانن چی دەکەن، چۆن دەکەن ؟ خوای پەروەردگار لەو کەسانەمان بگێڕێ، کە لە وردو درشتی ژیانیاندا پابەند دەبن بە یاساکانی شەریعەتەوە، وە خوا لەو کەسانەمان بگێڕێ، کە دڵیان پڕ دەبێ لە نوری ئیمانو تەقواو، بە چاکەو خێر نەبێ هەنگاو نانێن.

## چەند مەسەلەیەکی گرنگ

**مەسەلەی یەکەم:** کە خوای کاربەجێ دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا تَدَايَنتُم بِدَيۡنٍ إِلَىٰٓ أَجَلٖ مُّسَمّٗى فَٱكۡتُبُوهُۚ﴾، ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە ! هەرکاتێك قەرزتان بە یەکدیدا، یاخود مامەڵەیەکتان لەگەڵ یەکدیدا کرد، بە قەرز بۆ کاتێکی دیاریکراو، بینووسن، وشەی (تَدایُنْ) دیارە لەسەر کێشی (تَفاعُل)ە، (تَفاعُل)یش بۆ شتێکە کە بە هاوبەشیی بکرێ، لە نێوان دوو تەرەف یان زیاترداو، واتاکەی ئاوای لێ دێتەوە: (إذا دایَنَ بَعضُكُم بَعضاً) ئەگەر هەندێکتان قەرزتان دا بە هەندێکتان، هەندێکیش لە زانایان گوتوویانە: ماناکەی ئاوایە: (إذا تَبایَعْتُم بِدَینٍ) واتە: ئەگەر کڕینو فرۆشتنتان لەگەڵ یەکدیدا کرد بە قەرز، واتە: شتێکت بە کەسێك فرۆشت بە قەرز، جا لێرەدا زانایان گوتوویانە: ئایا جیاوازیی نێوان (دَین)و (قَرض) چییە؟ کە ئێمە بە کوردی بە هەردووکیان دەڵێین: قەرز، هەندێکیان گوتوویانە: جیاواز نین

---

١) رواه مسلم: (٢٥٦٤).

هەریەکن و دوو وشەی هاوواتان، بەڵام هەندێکیان گوتوویانە: جیان و دەڵێن: (القَرْضُ غَير الدَّينِ، لأنَ القَرْضَ أن يُقرِضَ الإنسانُ دَراهِمَ أو دَنانيرَ أو حَبّاً أو تَمْراً أَو مَا أشْبَه ذَلِكَ وَلا يَجُوزُ فِيهِ الأَجَلُ والدَّينُ يَجُوزُ فيهِ الأَجَلُ) واتە: قەرز جیایە لە (دَین) لە زمانی عەرەبیدا، چونکە قەرز ئەوەیە کەسێك دروەم (واتە: زیو)، یان دینار (واتە: زێڕ)، یاخود دانەوێڵە، یاخود خورما، یان وێنەی ئەوانە بدات بە کەسێك، بێ ئەوەی کاتی بۆ دیاری بکات، {بڵێ: فلان کاتە تۆ دەبێ ئەو شتەم بدەیەوە}، بەڵام (دَین) دەکرێ بۆ کاتێکی دیاریکراو بێ، وە هەندێك لە زانایان گوتوویانە: مەبەست لە (مُدايَنَة) ﴿إِذَا تَدَايَنتُم بِدَيْنٍ﴾، (سَلَمْ)ە، (سَلَمْ) چیە؟ (سَلَمْ) کە هەندێکیشیان (سَلَف)یشی پێدەڵێن، ئەوەیە کەسێك ئەندازەیەك پارە بدات بە کەسێك کە باغدارە، یاخود دانەوێڵە دەچێنێ، یان کەسابەتێك دەکات، کە ئەویش لە بەرانبەردا لە کاتی هەڵگرتنەوەی بەروبوومەکەیدا، ئەندازەیەك لەو بەروبوومەی خۆی بداتێ، لەوبارەوە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس خوا لە خۆی و بابی ڕازی بێ، ئاوای گوتوە: {(إِنَّها نَزَلَتْ في السَّلَفِ لأنَّ النَبيَّ ﷺ قَدِمَ المَدِينَةَ، وَهُمْ يُسْلِفُونَ بالتَّمْرِ السَّنَتَينِ والثَّلاثَ فَقَالَ: مَنْ أَسْلَفَ فِي شَيْءٍ فَفِي كَيْلٍ مَعْلُومٍ وَوَزْنٍ مَعْلُومٍ إِلَى أَجَلٍ مَعْلُومٍ) (رَوَاهُ البُخَارِيُّ برقم: (٢٢٤٠)، وَمسلم برقم: (٤٠٩٤)، وَالنَّسَائِيُّ برقم: (٤٦٣٠)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٣٤٦٣)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (١٣١١)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٢٢٨٠)}، واتە: ئەم ئایەتە دەربارەی سەلەف (سەلەم) هاتۆتە خوارێ چونکە پێغەمبەر ﷺ کاتێك چوو بۆ مەدینە، ئەوان لە خورمادا بۆ ماوەی دوو ساڵ و سێ ساڵ سەلەمیان پێکەوە دەکرد، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: هەرکەسێك سەلەم لە شتێکدا بکات، با بە پێوانێکی دیاریکراو {ئەوەندە تەنە، یان بە زاراوی[1] ئێرە: ئەوەندە حەڕبە}، وە کێشانێکی دیاریکراو، وە بۆ ماوەیەکی دیاریکراو، ئەو جۆرە مامەڵەیە بکرێ.

---

١) واتە: هەولێر.

**مەسەلەی دووەم:** کە خوای بێهاوتا دەفەرمویٚ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا تَدَايَنتُم بِدَيۡنٍ إِلَىٰٓ أَجَلٖ مُّسَمّٗى فَٱكۡتُبُوهُۚ ... ﴾، ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە! هەر کات بۆ کاتێکی دیاریکراو قەرزتان بە یەکدیدا بینووسن، زانایان لەوبارەوە کە ئایا نووسینی قەرز، مامەڵە بە قەرز یان قەرز، پێدان، ئەگەر مامەڵەشی تێدانەبیٚ، فەرزە یان سوننەتە؟ کەوتوونە مشتومڕەوە:

هەندێکیان وەك (عَطاءُ، ابن جُرَيج، نَخَعِي، ابنُ جَرير) گوتوویانە: ئەم ﴿ فَٱكۡتُبُوهُۚ ﴾ە، مانای پێویست بوون دەگەیەنیٚو، فەرزە هەر کاتێك کەسێك قەرزێکی بە کەسێکدا، یاخود مامەڵەیەکی لەگەڵ کرد بە قەرز، بنووسریٚ،

هەندێکیشیان گوتوویانە: ئەو فەرمانە لێرەدا بۆ پەسندیی (نَدبْ)ە، یانی: ئەگەر بنووسریٚ باشە، ئەوە ڕای زۆربەی زانایانە[1].

أ) بەڵگەی ئەوانەی کە دەڵێن فەرزە: دەڵێن ئەوەتا خوا فەرموویەتی: ﴿ فَٱكۡتُبُوهُۚ ﴾، صیغەی ئەمریش پێویست بوون (وجوب) دەگەیەنیٚ، مادام نیشانەو بەڵگەیەك نەبێت کە لە پێویست بوون لای بدات (صيغة الأمر يَدلُّ عَلَى الوُجُوب، إذَا لَمْ تَكُن هُنَاكَ قَرينَةٌ صارِفَة).

ب) بەڵگەی ئەوانەی کە دەڵێن سوننەتە:

**بەڵگەی یەکەم:** خوا ﷻ دوایی لە ئایەتی (٢٨٣)دا دەفەرمویٚ: ﴿ وَإِن كُنتُمۡ عَلَىٰ سَفَرٖ وَلَمۡ تَجِدُواْ كَاتِبٗا فَرِهَٰنٞ مَّقۡبُوضَةٞۖ فَإِنۡ أَمِنَ بَعۡضُكُم بَعۡضٗا فَلۡيُؤَدِّ ٱلَّذِي ٱؤۡتُمِنَ أَمَٰنَتَهُۥ ﴾ واتە: ئەگەر لە سەفەریٚ بوونو نووسەرتان دەست نەکەوت، با بارمتەی وەرگیراوبن، وە ئەگەر هەندێکتان لە هەندێکتان دڵنیابوون، با ئەو کەسەی کە بە ئەمیندار دانراوەو متمانەی پیٚکراوە، ئەو

---

١) (الجامع لأحكام القرآن)، ج: (٣)، ص: (٣٣٦، ٣٣٧).

سپاردەیەی کە لەلایەتی بیگێڕێتەوە بۆ خاوەنی، جا زانایان دەڵێن، کەواتە: لێرەدا پێویست نیە ئەو قەرزە بنووسرێ، ئەگەر متمانە لە نێوان قەرز پێدەرو قەرز وەرگردا هەبێ، کەواتە: نووسینی قەرز فەرز نیە.

**بەڵگەی دووەم:** دەڵێن مسوڵمانان بە درێژایی مێژوو، هەبووە قەرزیان نووسیوەو، جاری واش بووە نەیاننووسیوە، بەتایبەتی کە ئەندازەکەی کەم بووبێ، نەیاننووسیوە، کەواتە: ئەوە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە پێویست نیە.

منیش ڕام وایە کە ئەو تەعبیرە بۆیە وا هاتوە، تاکو هەردووك لایان بگەیەنێ ! چونکە جاری وا هەیە مامەڵە لەگەڵ یەکدا بە قەرز، یاخود قەرز بە یەکدیدادانەکە، حاڵەتەکەی وایەو هەلومەرجەکە وایە، پێویست بەوە دەکات کە بابای قەرز پێدەر دڵنیا بکرێتەوە، ئنجا لە حاڵەتی وادا با بنووسرێ، وە جاری واش هەیە پێویست ناکاتو ئەو کەسەی کە قەرزەکە وەردەگرێ یان مامەڵەی بە قەرزەی لەگەڵدا دەکات، جێی دڵنیاییو متمانەیەو، لەو حاڵەتەشدا با نەنووسرێ، بۆیە لە ڕاستیدا ڕستە قورئانییەکە، هەم پێویستبوونیشو هەم سوننەتبوونیش دەگرێتەوە، پێویستبوون بۆ کاتی خۆی، وە سوننەتبوونیش بۆ کاتی خۆیو، ئەوەش یەکێکە لە لایەنەکانی ئیعجازی قورئان، کە خوا ﷻ هەندێ شتی فەرمووە چەند واتایەك دەگرێتەوە، هەرکامیان لە حاڵەتی تایبەتی خۆیدا.

**مەسەلەی سێیەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ وَلْيَكْتُب بَّيْنَكُمْ كَاتِبٌۢ بِٱلْعَدْلِ ﴾، با نووسەرێك دادگەرانە لە نێوانتاندا بینووسێ، واتە: وای بنووسێ کە هیچ لایەك نەتوانێ ستەم لەوی دیکەیان بکەن، ڕێكو ڕاستو ڕوونو بێ گرێو گۆڵ بێ، چونکە جاری وایە شتێك دەنووسرێ، بەڵام گرێو گۆڵی تێدایە، جاری وایە شتێك لە بەینی دوو تەرەفان دەنووسرێ دوو سێ واتایان هەڵدەگرێ، خوا ﷻ ڕێنمایی کردووین، کە ئەو نووسەرەی لە نێوانیاندا ئەو شتە دەنووسێ، با وای بنووسێ، ئیشکالی تێدا نەمێنێ، بۆ وێنە: ئەو قەرزە بە نرخی ڕۆژ بدرێتەوە، یان بە نرخی ئەو کات ؟ با بنووسرێ، بە هەمان جۆرە

دراو بدرێتەوە، یان بە دراوێکی دیکە ؟! با بنووسرێ، ئەگەر ئەو شتانە بە ڕوونیی نووسران، مانای وایە نووسینێکی دادگەرانەیەو، هیچ کام لەم دوو لایە تووشی زیان و زەرەر نابن و، سەرئێشەو کێشەیان بۆ نایەتە پێش.

<u>**مەسەلەی چوارەم:**</u> کە دەفەرموێ: ﴿وَلَا يَأْبَ كَاتِبٌ أَن يَكْتُبَ كَمَا عَلَّمَهُ ٱللَّهُۚ فَلْيَكْتُبْ﴾، وە با نووسەرێك کە داوای لێ دەکرێ بنووسێ، لاملیی نەکات، کە بنووسێ، وەك چۆن خوا فێری کردوە، با بنووسێ، دیسان لێرەدا زانایان ڕاجیاییان هەیە:

❋ هەندێکیان گوتوویانە: ئەوەش مەبەست پێی ڕێنماییکردن (إرشاد)ە، نەك پێویست بێ.

❋ هەندێکیش گوتوویانە: بەڵکو مەبەست پێی ئەوەیە کە فەرزو پێویستە.

منیش پێم وایە ئەگەر هیچ نووسەرێك دەست نەکەوت جگە لەو کەسە کە داوای لێ دەکرێ، ئەوە لەسەری پێویستە بینووسێ، بە مەرجێك کە نووسینی قەرزەکە پێویست بێت و بە پێویست بزانرێت، ئەو کاتە لەسەری پێویست دەبێت، چونکە هەموو ئەو شتانەی کە کۆمەڵێك مسوڵمان و یان یەکێك لە مسوڵمانان پێویستیان دەبێت، پێویستە مسوڵمانان بۆی جێبەجێ بکەن و هاوکاریی بکەن، واتە: فەرزی کیفایەیە، فەرزی کیفایەش ئەگەر تەنیا کەسێك هەبوو، یان کۆمەڵێکی دیاریکراو هەبوون، جێبەجێی بکەن، لەسەریان دەبێتە فەرزی عەین، دیارە فەرزی کیفایەش کاتێك لەسەر ئەوانی دیکە لادەچێ، کە ئەگەر یەکێکیان یان هەندێکیان ئەنجامیاندا بایی ئەوەندە هەبن ئەنجامی بدەن، بەڵام ئەگەر تەنیا یەك کەس هەبوو ئەو فەرزە ئەنجام بدات، ئەو کاتە لەسەری دەبێتە فەرزی عەین و نابێ بڵێ: ئەگەر بیکەم ئەوە باشەو ئەگەر نەشیکەم قەیناکات ! هەروەها ئەگەر کارو پرۆژەیەکی پێویست هەبوو و ئەنجامدانی پەکی لەسەر کۆمەڵێك کەوتبوو، تەنیا ئەوانیش هەبوون پێی هەڵسن، دیسان لەسەریان دەبێتە فەرزی عەین.

**مەسەلەی پێنجەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ أَن يَكْتُبَ كَمَا عَلَّمَهُ ٱللَّهُ ﴾، واتە: وەك چۆن خوا چاکەی لەگەڵ ئەودا کردوەو فێری خوێندنو نووسینی کردوە، با ئەویش چاکە بکات لەگەڵ غەیری خۆیدا، وە ئەگەر خەڵکی پێویستیان پێی هەبووو سەریان تێیوەستا، با هاوکاریان بێو دەستی یارمەتییان بۆ درێژ بکات، وە مەرجیش نیە هەموو جارێ هاوکاریی‌و یارمەتی هەر سوننەت بێ، بەڵکو جاری وا هەیە لەسەر ئینسان پێویست دەبێ، مادام خەڵکێك پەکی لەسەر ئەو هاوکاریی‌و یارمەتییە کەوتبێ، بۆ وێنە: کەسێك لە پەنای تۆ کەوتۆتە چاڵێکەوە، یان کەوتۆتە ئاوێکەوەو ئەگەر دەرینەهێنی دەخنکێ، ئایا سوننەتە دەریبێنیەوە؟ نەخێر، بەڵکو فەرزە، یان زاڵمێك لە نیزیك تۆ دەیەوێ نەفەرێکی مەزڵووم بکوژێ، ئایا هەر سوننەتە هاوکاریی بکەی؟ نەخێر، بەڵکو لەسەرت فەرزە، وە ئەگەر کەمتەرخەمیی تێدا بکەی گوناهبار دەبی، کەواتە: مەرج نیە هاوکاریی‌و یارمەتیدانی ئێمە بۆ یەکدی، هەمیشە هەر سوننەت بێ، ئەگەر بیکەین خێربێو ئەگەر نەشیکەین گوناهمان نەگاتێ، بەڵکو جاری وا هەیە پێویستەو ئەوەش دەکەوێتە سەر ئەندازەو ڕێژەی ناچاریی‌و پێویستبوونی بابای هاوکارییکراوو، گرنگیی‌و بایەخیی ئەو کارە.

**مەسەلەی شەشەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ وَلْيُمْلِلِ ٱلَّذِى عَلَيْهِ ٱلْحَقُّ ﴾، با ئەو کەسەی کە هەقەکەی لایە لاملیی نەکاتو بیخوێنێتەوە، (إملاء) واتە: خوێندنەوە (يُمْلي عَلَيْهِ) واتە: بەسەریدا دەخوێنێتەوە، ﴿ وَلْيُمْلِلِ ٱلَّذِى عَلَيْهِ ٱلْحَقُّ ﴾، واتە: ئەو کەسەی قەرزەکە وەردەگرێو هەقەکەی دەکەوێتە لا، با ئەو دانی پێدابێنێ، بیڵێ، بۆچی ؟ چونکە ئێمە بنچینەیەکی شەرعییمان هەیە دەڵێ: (المَرءُ مُؤاخَذٌ بِإقرارِهِ) واتە: ئینسان بە دانپێهێنانی خۆی دەگیرێ، کەواتە: ئەو کەسە کە قەرزەکە وەردەگرێ، ئەگەر خۆی دانی پێدابێنێو بیڵێ، مانای وایە ناتوانێ دوایی لامو جیم بکات، بابای خاوەن قەرز دەڵێ: تۆ بۆخۆت گوتووتە، هەروەها لە بنچینە شەرعییەکانە: (الإِقْرَار سَيِّدُ الأَدِلَّةَ) واتە: دانپێداهێنان گەورەی هەموو بەڵگەکانە.

**مەسەلەی حەوتەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ وَلْيَتَّقِ ٱللَّهَ رَبَّهُۥ وَلَا يَبْخَسْ مِنْهُ شَيْـًٔا ﴾، با لە پەروەردگاری خۆی پارێز بکات‌و هیچی لێ کەم نەکاتەوە، واتە: ئەو کەسە کە قەرزەکە وەردەگرێ، با کاتێك کە دەیلێ بۆ ئەوەی بنووسرێ‌و تۆمار بکرێ، یاخود با شایەدەکانی کە قسە دەکەن، با پارێز لە خوا بکەن‌و هیچی لێ کەم نەکەنەوە، ئەمە ئەوەی لێوەردەگیرێ کە ئینسان ئەگەر پارێز لە خوا بکات‌و ئەهلی تەقوا بێ، مافی خەڵکی پێشێل ناکات، ئەوەش شتێکی سەلمێنراوەو شتێکە جەرِبێنراوەو، ئینسان بە ئەندازەی ئەوە کە ترسی خوای لە دڵدایەو هەست بە چاودێریی خوا دەکات، وە بڕوای بە لێپرسینەوەو سزاو پاداشتی خوا هەیە، بێگومان هەق‌و مافی خەڵکی پێشێل ناکات، بۆیەش پێشینان گوتوویانە: لەوە بترسە کە لە خوا ناترسێ، لەوە مەترسە، کە لە خوا دەترسێ !

**مەسەلەی هەشتەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ فَإِن كَانَ ٱلَّذِى عَلَيْهِ ٱلْحَقُّ سَفِيهًا أَوْ ضَعِيفًا أَوْ لَا يَسْتَطِيعُ أَن يُمِلَّ هُوَ فَلْيُمْلِلْ وَلِيُّهُۥ بِٱلْعَدْلِ ﴾، ئنجا ئەو کەسەی کە هەقەکەی لەسەرە ئەگەر نەفام بوو، یاخود بێهێز بوو، یان نەیدەتوانی ئەو هەقە بڵێ‌و دانپێدابێنێ‌و دەریببڕێ، با سەرپەرشتیارەکەی بە شێوەیەکی دادگەرانە ئەو هەقە کە دەکەوێتە لای دانی پێدابێنێ، (بۆ ئەوەی کە بنووسرێ)، لێرەدا خوا ﷻ سێ پاساوی هێناوەتەوە بۆ ئەوەی ئەو کەسە کە قەرزەکە وەردەگرێ، بۆخۆی نەیلێ:

**یەکەم:** ئەگەر نەفام بێ، نەفامییش دەگونجێ مەبەست پێ گێلیی بێ، واتە: با ئەو کەسە باڵغیش بێ، بەڵام گێل بێ، هەندێ کەس هەیە بە خوارِسك عەقڵی تەواونیە، یاخود لەبەرئەوە کە منداڵەو جارێ عەقڵی تەواو نەبووە.

**دووەم:** ئەگەر بێهێز بێ، بۆ وێنە: لەو حاڵەتەدا نەخۆشبێ‌و نەتوانێ ئامادەی ئەو مەجلیسە بێ.

**سێیەم:** ئەگەر توانای قسەکردنی نەبێ، یان نەتوانێ قسە بکات لەبەرئەوە کە لاڵە یاخود زمانی دەگیرێ، لەو سێ حاڵەتانەدا، دروستە کە سەرپەرشتیاری ئەو کەسە لەجیاتی ئەو دان بە قەرزەکەدا دابنێ.

**مەسەلەی نۆیەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ وَٱسۡتَشۡهِدُواْ شَهِيدَيۡنِ مِن رِّجَالِكُمۡ ﴾، دوو شایەدان لە پیاوەکانتان بە شایەد بگرن، واتە: وێڕای نووسین با دوو پیاویش ببنە شایەد لە بەیندا، ئەوە بۆ چییە ؟ لە ڕاستیدا ئەوە گرنگی ماڵو سامان دەگەیەنێ لە تەرازووی شەریعەتدا، وە گرنگی پێدانی خوای پەروەردگاریش دەگەیەنێ لە مەسەلەی پاراستنی ماڵو ساماندا، بۆیە بۆ ئەوەی ڕێگا بگیرێ لە زایەبوونی ماڵو سامانی خەڵك، بە تایبەتی کەسێك کە هاوکاریی خەڵك دەکاتو قەرزیان پێدەدا، یان مامەڵەیەکی بە قەرزیان لەگەڵدا دەکات، هەر بەوەندە وازی نەهێناوە بنووسرێ، ئەویش بەو وردەکارییانەوە کە خوا باسی کردوون، بەڵکو فەرمووشیەتی: دوو پیاویش شایەد بن ! کەواتە: دەبێت دوو شایەد هەبنو نابێ کەمتربن، وە کە دەفەرموێ: ﴿ مِن رِّجَالِكُمۡ ﴾، یانی: دەبێ مسوڵمان بنو کافر نەبن، وە دەبێ پیاو بنو ئافرەتو منداڵ نەبن، جا لێرەدا زانایان مشتومڕیان هەیە لەسەر ئەوە کە ئایا لە دوو شایەد کەمتر دەبێ ؟ وە ئایا ئەگەر شایەدەکان مسوڵمان نەبن حوکمی چییە ؟ وە ئایا ئەگەر پیاو نەبن حوکمی چییە ؟ هەڵبەتە ئەگەر شایەدەکان پیاو نەبن یانی: یەکێکیان پیاو نەبێ، ئەوە ئایەتەکە بۆخۆی ڕوونی کردۆتەوە، بەڵام لەسەر ئەوانی دیکە زانایان کێشەیان هەیە:

* هەندێکیان گوتوویانە: کە دەفەرموێ: ﴿ مِن رِّجَالِكُمۡ ﴾، لە پیاوانتان، واتە: لە پیاوانێك کە لە کۆمەڵگای ئیسلامییدان، واتە: ئەگەر مسوڵمانیش نەبن دەیانگرێتەوە، ئنجا ئەوە کە لە دووان کەمتر نەبن، زانایان لەوەدا مشتومڕیان هەیە، کە ئایا شایەدێك وە کابرای دەعواکار (مُدَّعي) خۆیشی سوێند بخوا، ئەوە جێی شایەدەکەی دیکە پڕ دەکاتەوە ؟
* (أبو حَنيفة) ڕەحمەتی خوای لێبێ دەڵێ: نەخێر، هەر دەبێ دوو پیاو شایەدبن بە بەڵگەی ئەم ڕستە قورئانییە: ﴿ وَٱسۡتَشۡهِدُواْ شَهِيدَيۡنِ مِن رِّجَالِكُمۡ ﴾.

❋ بەلاَم (شافِعي)و هەندێکی دیکە لە زانایان دەڵێن: بەڵێ شایەدێك‌و سوێند خواردنی دەعواکار بە دوو شایەد دەشێن، بۆچی ؟ دەڵێن: چونکە پێغەمبەر ﷺ وای حوکم کردوە، وەك عەبدوڵلاَی کوڕی عەبباس گێڕاویەتەوە، وەك لە (صَحِيح)ی موسلیم‌و لە (سُنَن)ی ئەبو داوودو (سُنَنْ)ی ئیبنو ماجەشدا هاتوە: {(أنَّ النبيَّ ﷺ قضى باليمين مع الشاهد)}[1]، کە پێغەمبەر ﷺ بۆ ئیسپاتی دەعوایەك شایەدێك‌و سوێند خواردنی کابرای دەعواکاریشی بە بەڵگە داناوە.

**مەسەلەی دەیەم:** کە دەفەرموێ: ﴿فَإِن لَّمْ يَكُونَا رَجُلَيْنِ فَرَجُلٌ وَٱمْرَأَتَانِ﴾، جا ئەگەر دوو پیاوتان چنگ نەکەوتن، پیاوێك‌و دوو ئافرەت، هەڵبەتە لێرەشدا دیسان کە ئایا دەگونجێ وەك چۆن دوو ئافرەت لەجیاتی شایەدی دووەم بەکاردێن، لەجیاتی شایەدی یەکەمیش دوو ئافرەتی دیکە ببنە شایەد، واتە: لەجیاتی دوو پیاو بن، چوار ئافرەت بن ؟ لەوەشدا زانایان مشتومڕیان هەیە:

❋ هەندێکیان دەڵێن: بەڵێ مادام لەجیاتی پیاوی دووەم‌و شایەدی دووەم دوو ئافرەت ببن، کەواتە: لەجیاتی پیاوی یەکەمیش ئەگەر دوو ئافرەتی دیکەبن، واتە: چوار ئافرەت لە جیاتی دوو پیاوان، ئەوە ئەو مامەڵەیە ئیسپات دەبێ.

❋ هەندێکیش گوتوویانە: نەخێر بەڵکو هەر دەبێ پیاوێك هەبێ‌و ئنجا لەجیاتی شایەدی دووەمیش دوو ئافرەت بن، بەلاَم لێرەدا پرسیارێك دێتە پێشێ: ئایا بۆ هەموو مەسەلەیەك هەردوو ئافرەت لە بەرانبەری پیاوێك دان بۆ شایەدیی دان ؟ کە هەندێك لەوانەی کە لە شەریعەت شارەزانینە هەر لەخۆوە بیانوو بە ئیسلام دەگرن‌و ئەوە دەکەنە بەڵگە لەسەر ئەوە کە ئیسلام بە چاوی سووك تەماشای ئافرەت دەکات‌و، ئافرەت بە کەمتر لە پیاو دادەنێ ؟! بەلاَم لەڕاستییدا ئەوە وانیە، چونکە زانایان دەڵێن: ئەوە تەنیا بۆ بواری ئابووریی‌و بازرگانییەو زۆربەی شەرعزانان دەڵێن: ئەوەی کە دەقی لەسەرە، لێرەدا، مەسەلەیەکی ئابووریی‌و دارایی لێرەدا دوو ئافرەت لە بەرانبەر

---

١) (صحيح مسلم): (١٧١٢)، وأبو داود: (٣٦٠٨)، وإبن ماجه: (٢٣٧٠).

پیاوێکن بۆ شایەدیی، بەڵام مەرج نیە لە بوارەکانی دیکەدا وابێ، بەڵکو بواری وا هەیە شایەدییدانی ئافرەت وەك هی پیاوە، بگرە بواری وا هەیە کە تایبەتە بە ئافرەتانەوە، وەك مەسەلەی شیر پێدانو ئاوس بوون (حَمل)و، ئەو جۆرە مەسەلانەی کە تایبەتن بە ئافرەتانەوە، تەنیا شایەدیی لە ئافرەتان وەردەگیرێو پیاو تێیاندا بە شایەد وەرناگیرێ[1]، وەك من لە کتێبی (ئافرەتو خێزان لە سایەی شەریعەتدا) لەوبارەوە باسم کردوە، ئنجا بۆچی دەبێ دوو ئافرەت لە بەرانبەری پیاوێکدا بن ؟ خوای پەروەردگار دوایی حیکمەتەکەی ڕوون دەکاتەوە، وەك لە مەسەلەی دوازدەیەمدا باسی دەکەین.

**مەسەلەی یازدەیەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ مِمَّن تَرْضَوْنَ مِنَ ٱلشُّهَدَآءِ ﴾، لەوانەی کە لێیان ڕازین لە شایەدان، واتە: ئەو شایەدانەی کە پەسەندیان دەکەنو لە لای ئێوە متمانە پێکراون، ئەوە لە شوێنی دیکە لە قورئاندا، خوا ڕوونی کردۆتەوە، کە دەفەرموێ: ﴿ ...وَأَشْهِدُواْ ذَوَىْ عَدْلٍ مِّنكُمْ... ﴿٢﴾ ﴾ الطلاق، دوو کەسی دادگەر لە خۆتان بە شایەد بگرن، کەواتە: ﴿ مِمَّن تَرْضَوْنَ مِنَ ٱلشُّهَدَآءِ ﴾، ئەو شایەدانەی کە لێیان ڕازینو لاتان پەسەندن، یانی: شایەدی دادگەر (عَدْل)، شایەدی دادگەر کێیە ؟ شایەدێکە کە ڕێكو ڕاست بڕواو بە لای کەسدا دای نەشکێنێ، ئەوەش زانایان تەرازوویێکیان بۆ داناوە، دەڵێن: دادگەر کەسێکە گوناهی گەورە نەکات، گوناهی گەورەش هەر گوناهێکە سزای دنیایی، یاخود هەڕەشەی قیامەتی لەسەربێ، کەواتە: هەر کەسێك ئەو جۆرە گوناهانەی نەبوو، واتە: واجبەکانی نەچوواندبوو، وە قەدەغەکانی نەشکاندبوو، ئەوە دادگەر (عَادِل)ە، لە پێناسەی شەرعدا، چونکە کەسێك کە گوناهی گەورە بکات، مانای وایە دەگونجێ شایەدیی بە درۆش بدا، لەبەرئەوە شایەدیی لێ وەرناگیرێت، زانایان گوتوویانە: شایەدی دادگەر دەبێ دە سیفەتی تێدا بن، وە ئەم سیفەتانەیان

---

١) بڕوانە: (الطرق الحكيمة في السياسة الشرعية) لإبن القيم، ص : (١٤٥)، (فصل شهادة النساء نوعان : ١- نوع يقبل فيه النساء منفردات. ٢- و نوع لا يُقبَلْنَ فيه الاّ مع الرّجال).

ژماردوون: (أن يَكونَ حُرًّا، بالِغاً، مسلماً، عَدْلاً، عالِمَاً بِمَا شَهِدَ بِهِ، غَيْرَ جَالِبٍ بِشَهَادَةٍ نَفعاً إلى نَفسِهِ، وَلاَ دَافِعٍ مضرةً عَنها، غَيْرَ مَعرُوفٍ بِكَثرَةِ الغَلَطِ، غَيرَ تارِكٍ للمروءَة، لا يَكونُ بَينَهُ و بَينَ مَن يَشهَدُ عَلَيهِ عِدَاءٌ):

١/ (حُرًّا): دەبێ ئازاد بێو کۆیلە نەبێ، هەڵبەتە ئێستا مەسەلەی کۆیلایەتی لە گۆڕێدا نەماوە، وە من پێشم وایە هیچ بەڵگەیەکی پشت پێبەستراو لەوبارەوە نیە، کە جیاوازیی لەنێوان ئازادو کۆیلەدا هەبێ.

٢/ (بالِغاً): دەبێ باڵغ بێو منداڵ بە کەڵکی شایەدیی نایەت.

٣/ (مسلماً): دەبێ مسوڵمان بێ، هەڵبەتە هەندێك لە زانایان دەڵێن: نەخێر، مسوڵمانیش نەبێت دەبێ، منیش پێم وایە مەگەر مەسەلەیەکی وابێ مۆرکێکی ئیسلامیی هەبێو تایبەتمەندیی یەکی ئایینی مسوڵمانانی بێ، ئەگەر نا مادام ئەو کەسە متمانە پێکراو بێ، بە شایەد دەشێ.

٤/ (عَدْلاً): بەو واتایە کە گوناهی گەورەی نەبێ.

٥/ (عَالِمَاً بِمَا شَهِدَ بِهِ): زانا بێ بەوەی کە شاهێدیی دەربارە دەداتو، شارەزای بێو ئاگای لە شتەکە هەبێ.

٦/ (غَيْرَ جالِبٍ بِشَهادَةٍ نَفْعاً إلى نَفسِهِ): لەو شایەدییەدا کە دەیدات، سوودێك بەوی نەگات، کەواتە: شایەدییدانی ئینسان بۆخۆی دروست نیە، وە شایەدیی دانی ئینسان بۆ براو خزمی وەرناگیرێ.

٧/ (وَلاَ دافِعٍ مضرةً عَنهَا): بەو شایەدییدانەی زەرەرێك لەخۆی دوور نەخاتەوە.

٨/ (غَيْرَ مَعرُوفٍ بِكَثرَةِ الغَلَطِ): ناسراو نەبێ بەوەی کە زۆر هەڵە بکاتو بە هەڵەدا بچێ.

٩/ (غَيْرَ تارِكٍ للمرؤة): شتێك نەکا پێچەوانەی جوامێریی بێ، کە ئەوەش بە پێی عورفو باوی ئەو ڕۆژگارە دیاریی دەکرێ.

١٠/ (لاَيَكُون بينَهُ وبَيْنَ مَنْ شَهِدَ عَلَيهِ عِداءٌ): وە نابێ ئەو کەسەی کە شایەدیی لەسەر دەدا دوژمنایەتی لە نێوانیاندا هەبێت.

**مەسەلەی دوازدەیەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ أَن تَضِلَّ إِحْدَىٰهُمَا فَتُذَكِّرَ إِحْدَىٰهُمَا ٱلْأُخْرَىٰ ﴾، خوای کاربەجێ لێرەدا پاساوی ئەوە دێنێتەوە، کە بۆچی دەبێ دوو ئافرەت بن ؟ دەفەرموێ: بۆئەوەی ئەگەر یەکێکیان لەبیری چووو بە هەڵەدا چوو، ئەوی دیکەیان بیری بخاتەوە، ئنجا بۆچی ئافرەت دەگونجێ لەبیری بچێ ؟!

**یەکەم:** ئافرەت بەزەیی‌و سۆز بەسەریدا زاڵە.

**دووەم:** ئافرەت هەندێك حاڵەتی بەسەردا دێن وەك عادەی مانگانە (حَیض)و زەیستانیی (نِفاس)و ئەوانە، کاریگەریی بۆ سەر هەست‌و هۆشی هەیە.

**سێیەم:** پاشان ئافرەتان لەنێو هەموو عورف‌و باوی دنیادا، کەمتر وایە زۆر سەرگەرمی بواری ئابووریی‌و مامەڵەو بازرگانیی بن، وە هەرکەسێکیش لە بوارێکدا شارەزا نەبێ‌و زۆر ئیشی تێدا نەکردبێ، زەبت‌و کۆنترۆڵی تێیدا کەمتر دەبێ.

**مەسەلەی سێزدەیەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ وَلَا يَأْبَ ٱلشُّهَدَآءُ إِذَا مَا دُعُواْ ﴾، وە شایەدەکان هەرکاتێ بانگکران با لاملیی نەکەن، واتە: کەسێك ئاگای لەو قەرزە بووە کە دراوەو ئاگای لەو مامەڵەیە بووە، وە لەو مەجلیسەدا بووە، بانگ دەکرێ: وەرە شایەدیی بدە ! چونکە ئەو دوولایەنە کەوتوونە کێشەوە، یەکێیان دەڵێ: ئەوەندە بوو، ئەوی دی دەڵێ: ئەوەندە نەبووە، یاخود بابای قەرزدار هەر ئینکاریی قەرزەکە دەکات‌و نکووڵیی لێ دەکات ! خوا دەفەرموێ: با ئەو کەسە کە شایەدەو ئاگاداری شتەکە بووە، لاملیی نەکات، ئنجا لەوەشدا شەرعزانان کەوتوونە مشتومڕەوە، کە ئایا لەسەری پێویستە یان نا ؟ هەندێك گوتوویانە: پێویست نیە، وە هەندێکیان گوتوویانە: پێویستە، بەڵام بە تەئکید مادام خوا دەفەرموێ: ﴿ وَلَا يَأْبَ ٱلشُّهَدَآءُ إِذَا مَا دُعُواْ ﴾، کاتێك شایەدەکان بانگکران با لاملیی نەکەن‌و بچن ئامادەبن شایەدیی بدەن، ئەوە زۆر بە ڕوون‌و ڕاشکاویی ئەوە دەگەیەنێ کە پێویستە، چونکە خوا ئەوەی قەدەغە کردوە کە شایەد نەچێ، جا ئەگەر نەچوون قەدەغەبێ، کەواتە: چوونی پێویستە، بە تایبەت

لە حاڵێکدا کە ئەو نەچێت ئەو هەقە زایە ببێ، ئەو کاتە لەسەری پێویست دەبێ کە بچێ ئەو شایەدییە بدات، بۆ ئەوەی کە ئەو هەقە زایە نەبێو بەرگریی لە بابای خاوەن هەق بکاتو هەقەکە نەفەوتێ.

**مەسەلەی چواردەیەم:** دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تَسْـَٔمُوٓاْ أَن تَكْتُبُوهُ صَغِيرًا أَوْ كَبِيرًا إِلَىٰٓ أَجَلِهِۦ ﴾، وە بێزار مەبن لە نووسینی، گچکە بێ یان گەورە بێ، تا کاتی دیاریکراوی خۆی، بۆیە خوا ﷻ وای فەرموە، چونکە جاری وا هەیە کابرا گوێی پێناداو دەڵێ: پێوست بە نووسینی ناکات، ئەو ماندوبوونو زەحمەتەی بۆچییە ؟! خوا ﷻ دەفەرموێ: نەء ! بێزار مەبنو ماندوو مەبنو بینووسن، لە دواییدا حیکمەتەکانی ڕوون دەکاتەوە بۆچی خوا ﷻ بە پێویستی دەزانێ بنووسرێ، جا دەفەرموێ: ﴿ صَغِيرًا أَوْ كَبِيرًا ﴾، گچکە بێ، یان گەورە بێ، واتە قەرزەکە کەم بێ، یان زۆر بێ، هەڵبەتە لێرەدا کە دەفەرموێ: کەم بێ یان زۆر بێ، بێزار مەبن لە نووسینی، یانی: ئەو شتانەی کە مەترسییتان هەیە، مشتومڕیان لێ پەیدابێ، بەڵام دوو مسوڵمان زۆر متمانەیان بە یەکدی هەیە، دوو دراوسێ، دوو خزم، هیچ مەترسیی ئەوەیان نیە کە دوایی کێشەو مشتومڕیان لێ پەیدابێ، یان کابرای قەرزدار ئەگەر گریمان دوایی گوتی: قەرزی تۆم لەلا نیە، بابای خاوەن قەرز بەلاشیەوە گرنگ نەبێ، ئەو کاتە بایی ئەوەندە کە لە کێشەو بێشەو سەرئێشە ناترسێن، پێویستبوونەکەی کەم دەبێتەوە.

**مەسەلەی پازدەیەم:** خوا ﷻ سێ هۆکار دێنێتەوە بۆ پێویستبوونی نووسینی قەرز، یاخود مامەڵەی بە قەرز، لەنێو مسوڵمانانندا، وەك پێشتریش باسمان کرد:

١) ﴿ ذَٰلِكُمْ أَقْسَطُ عِندَ ٱللَّهِ ﴾، ئا ئەو قەرز نووسینەتان لە نێوانی خۆتاندا، دادگەرانەترە لای خوا واتە: خوا ئەوەی پێ چاکەو ئەوەی پێ دادگەرانەترە.

٢) ﴿ وَأَقْوَمُ لِلشَّهَٰدَةِ ﴾، وە ئەو قەرز نووسینە، بۆ شایەدیی دانەکەش هاوکارترو یارمەتیدەرترە، شایەدێك کە شایەدیی دەدا ئەگەر نووسینێکی لەبەر دەست هەبێ، نووسینەکە دەبێتە پاڵپشت بۆ شایەدیی دانەکەی.

٣) ﴿ وَأَدْنَىٰٓ أَلَّا تَرْتَابُوٓا۟ ﴾، پاشان دەبینی قەرزەکە چەند ساڵی بەسەردا تێپەڕیوەو ئەو شایەدانەش سەرقاڵییان بووەو، باش لەزەینیاندا نەماوە، ڕێژەو ئەندازەو چۆنیەتییەکەی، دیارە ئەگەر نووسرابێ، ئەوە نزیکترە بۆ ئەوەی کەسیان نەکەوێتە دوودڵیی‌و گومانەوە، دیارە شەریعەتی خوای پەروەردگاریش هەموو حوکمەکانی هەر وان‌و ئامانجیان ئەوەیە کە شت ڕێکتربێ، بۆیەش خوا ئەوەی زیاتر لەلا پەسندەو پێی چاکە، چونکە بۆ خەڵك کەمتر سەرئێشەی تێدایە، خوای بە بەزەییش چی پێ‌خۆشە بۆ بەندەکانی ؟ بێگومان ئەوەی پێ‌خۆشە کە بۆ ئەوان باشتربێ‌و بەرژەوەندیی ئەوان چاکتر بێنێتە دی.

**مەسەلەی شازدەیەم:** خوا ﷻ حاڵەتێك جیادەکاتەوە لەو حوکمە گشتییەو هەڵیدەاوێرێ‌و دەفەرموێ: ﴿ إِلَّآ أَن تَكُونَ تِجَـٰرَةً حَاضِرَةً تُدِيرُونَهَا بَيْنَكُمْ فَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَلَّا تَكْتُبُوهَا ﴾، مەگەر بازرگانییەکی ئامادەبێ دەستاو دەست بێ‌و دەستبەجێ بێ، لە بەینی خۆتاندا هەڵی سووڕێنن، ئەوە گوناهتان ناگاتێ ئەگەر نەینووسن، واتە: لەو حاڵەتەدا پێویست بە نووسین ناکات، یەکێك شتێك دەکڕێ لە بازاڕ، یەکسەر دەڵێن: ئەو شتە بە چەندە ؟ بەوەندە، شتەکەی لێ وەردەگرێ‌و پارەکەی وێدەدا، یاخود لە هەر شوێنێکی دیکە، شتێك دەست بە دەست بێ، مادام قەرز نەبێ‌و بۆ کاتی دیکە نەبێ، ئەوە لەو حاڵەتەدا نووسینەکەی پێویست ناکات، بۆچی ؟ چونکە گرفت‌و کێشەی تێدا نایەتە دی، تازە ئەو شتی خۆی وەرگرتووەو پارەی خۆی داوە.

**مەسەلەی حەڤدەیەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ فَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَلَّا تَكْتُبُوهَا ﴾، واتە: گوناهتان ناگات کە نەینووسن، کە لێرەدا مەبەستی ئەوەیە زیانی نیە (فَلا مَضَرَّةَ عَلَيكُمْ)، بۆچی ؟ چونکە مادام مامەڵەو بازرگانییەکی دەستبەجێ‌و دەست بەدەستە، زەرەری نیە ئەگەر نەنووسرێ، تازە کڕیار شتی خۆی وەرگرتووەو فرۆشیار پارەی خۆی وەرگرتووە، واتە: هەر بە کردەوە نە نووسینەکە زەرەری نیە، بۆیەش خوا ﷻ لەو حاڵەتانەدا گوناهی لەسەر مسوڵمانان هەڵگرتووە،

ئەگەر ئەو قەرزە نەنووسن، چونكە تووشی كێشەو گیروگرفت نابن.

هەڵبەتە ئەم ڕستە قورئانییە لێی دەفامرێتەوە كە مسوڵمانان بە كەمتەرخەمیی تێداكردنی نووسینی قەرزو مامەڵەیەك كە نەنووسینو تۆمارنەكردنی سەرئێشەی لێدەكەوێتەوە، گوناهبار دەبن، جا دیارە بۆ هەر شتێكی دیكەش هەر وایەو هەمان حوكمی هەیە.

**مەسەلەی هەژدەیەم:** ﴿وَأَشْهِدُوٓاْ إِذَا تَبَايَعْتُمْ﴾، وە شایەد بگرن هەر كاتێك كڕینو فرۆشتنتان كرد، واتە: مامەڵە ئەگەر نووسینیشی تێدانەبێ، پێویستە شایەدی هەر تێدا هەبن، دیارە ئەمیش زانایان ڕاجیان تێیدا:

* هەندێك گوتوویانە: مەبەست پێی شتێكی پەسندو باشە، واتە: سوننەتە، شایەد بگرن.
* هەندێكیشیان گوتوویانە: نەخێر شایەدگرتن فەرزە، هەڵبەتە ڕواڵەتی وشەی: ﴿وَأَشْهِدُوٓاْ﴾، هەردووكی دەگرێتەوە، بۆیە ئێمەش دەڵێین: سوننەتە شایەد بگیرێ لە كاتێكدا مەترسیی گرفتو كێشە كەم بێ، وە پێویستە شایەد بگیرێ لە كاتێكدا كە مەترسیی گرفتو كێشە پەیدابوون لەنێوان كڕیارو فرۆشیاردا زۆربێ، وە بەپێی هەبوونی ئەگەری كێشەو گرفت حوكمەكە دەگۆڕێ.

**مەسەلەی نۆزدەیەم:** ﴿وَلَا يُضَآرَّ كَاتِبٌ وَلَا شَهِيدٌ﴾، وە با هیچ نووسەرێكو هیچ شایەدێك زیانیان پێ نەگەیەنرێ، ئەوە ئەگەر ئەسڵی وشەی: (يُضَآرَّ) (يُضَآرَرْ)بێ، بەڵام ئەگەر ئەسڵی (يُضَآرَّ) (يُضَآرِرْ) بێ، واتە: با نووسەرو شایەد زیان نەگەیەنن، جا ئایا نووسەرو شایەد چۆن زیانیان پێ دەگات ؟! بابای نووسەر ئیشێكی دیكەی هەیەو سەرقاڵە بە كارێكی دیكەوە، نابێ هەڵپێچرێو بڵێین: وەرە بینووسە، یاخود ئەگەر داوای كرێی كرد، نەیدرێتێ، یاخود لە مافی خۆی كەمتری بدرێتێ، ئەوە زیانی پێ دەگەیەنرێ، وە شایەد لەسەر ئەوە كە هەق دەڵێ، با زیانی پێ نەگەیەنرێو هەڕەشەی لێ نەكرێو بوغزی لێ دانەگیرێ، ئەوە لە حاڵێكدا كە مەبەست ئەوەبێ: نووسەرو شایەدەكە زیانیان پێ

نەگات، بەڵام ئەگەر بەمجۆرە بخوێنرێتەوە (يُضَآرِرْ)، واتە: نووسەرو شایەدەكە با زەرەر نەدەن، یانی: بابای نووسەر كە دەینووسێ، وا بینووسێ زەرەری نە بۆ كڕیار هەبێ نە بۆ فرۆشیار، نە بۆ قەرز پێدەر، نە بۆ قەرز وەرگر، وە هەروەها شایەدەكەش با شایەدییەكەی بداتو شایەدیەكەی نەشارێتەوە، وە ڕێكو ڕاست شایەدیی بدات، وە نووسەرەكەش ڕێكو ڕاست بینووسێ.

**مەسەلەی بیستەم:** كە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿وَإِن تَفْعَلُواْ فَإِنَّهُۥ فُسُوقُۢ بِكُمْ﴾، وە ئەگەر وابكەن ئەوا لارێییە بۆ ئێوە، وشەی (فُسُوق) لە (فَسَقَ)ەوە هاتوە، (فَسَقَ) واتە: (خَرَجَ) دەرچوو، (فاسِق) كەسێكە كە لە جادەی شەرع دەرچووە، جا خوا دەفەرموێ: ئەگەر وابكەن، واتە: نووسەرو شایەد زیانیان پێ بگەیەنرێ، یان نووسەرو شایەد زیان بگەیەنن بە كڕیارو فرۆشیار، بە قەرزدەرو قەرز وەرگر، هەركامێكتان وا بكات، ئەوە پێی فاسق دەبێو، لە ڕێ دەردەچێو پێی گوناهبار دەبێ.

**مەسەلەی بیستو یەكەم:** ﴿وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۖ وَيُعَلِّمُكُمُ ٱللَّهُ﴾، وە پارێز لە خوا بكەنو خوا فێرتان دەكات، واتە: ئێوە پارێز لە خوا بكەن كە پابەندبن بە شەریعەتەكەیەوە، خواش بەو شێوەیە یاساكانی شەریعەتی خۆیتان فێردەكات، هەندێك لە ئەهلی تەصەووف گوتوویانە: ئەمە ئەوەی لێوەردەگیرێ كە ئینسان ئەگەر موتتەقیو پارێزكاربێ، پێویستی بەوە نیە بچێ قورئانو سوننەت بخوێنێو شارەزای شەریعەت بێ، بەڵكو لە ئەنجامی تەقواكەیدا خوای پەروەردگار شارەزای دەكات لە شەریعەت! بەڵام لەڕاستییدا ئەو جۆرە تێگەیشتنە هەڵەیەو ئەگەر وابایە خوا دەیفەرموو: (وَاتَّقُوا اللهَ يُعَلِّمْكُمُ اللهُ)، یان دەیفەرموو: (وَاتَّقُوا اللهَ فَيُعَلِّمُكُمُ اللهُ) پارێز لە خوا بكەن، خوا فێرتان دەكات، یان: پارێز لە خوا بكەن، جا خواش فێرتان دەكات، بەڵام لێرەدا خوا فەرموویەتی: پارێز لە خوا بكەن، وە خواش فێرتان دەكات، یانی: ئەگەر ئێوە ئەركی خۆتان بەرانبەر بە خوای میهرەبان جێبەجێی كرد، خوای بەخشەریش ئاوا بەو شێوەیە شەریعەتی خۆی بۆ ئێوە بەیان دەكات، وە لەڕاستییدا پارێز

لە خوا دەبێتە مایەی دڵ ڕۆشنیی بۆ ئینسانو، دەبێتە مایەی ئەوە کە ئینسان زیاتر سەر ڕاستو شارەزا بێو، لە خوا نزیك بێو دڵی ڕۆشن بێ، بەڵام نەبووە بە عادەت کە لە ئەنجامی تەقواو تەزکیەی نەفسدا ئینسان فێری قورئانو سوننەت ببێ !! ئەگەر وا بووایە پێغەمبەر ﷺ، وە هەموو پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) پێویستی نەدەکرد وەحییان بۆبێ، چونکە ئەوان لە هەموو کەس زیاتر ئەهلی صەفاو ئەهلی تەقوا بوو ونو لە هەموو کەس بێ گوناحترو پاکتربوون، بەڵام ئەوەتا خوا ﷻ بە پێویستی زانیوە کە وەحی بۆ پێغەمبەران بنێرێ، وە خوای زانا خۆی فەرموویەتی: ﴿ ...وَعَلَّمَكَ مَا لَمْ تَكُن تَعْلَمُ ... ﴿١١٣﴾ ﴾ النساء، واتە: (بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ): شتێکی فێرکردووی کە نەدەگونجا بیزانی، یانی: بۆت نەدەکرا بیزانی ئەگەر خوا فێری نەکردبای، وە ئەگەر وەك حاڵەتی خۆت مابایەوە، نەدەگونجا فێری ببی، جا ئەگەر پێغەمبەر ﷺ لە ئەنجامی صافبوونەوەو تەزکیەو عیبادەت بۆ خوای پەروەردگارەوە، نەتوانێت لە شەریعەت شارەزابێ بەبێ هاتنی وەحی، بێگومان غەیری پێغەمبەر ﷺ لە پێشترە کە بێ ئەوەی لە قورئانو سوننەت شارەزابێ، شارەزای ئەمرو نەهی خوای کاربەجێ نەبێ.

**مەسەلەی بیستو دووەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ وَٱللَّهُ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ ﴾، واتە: وە خوا بە هەموو شتێك زانایە، ئەمەش بۆ ئەوەی کە مسوڵمان دڵنیا بێت، هەڵبەتە ئەوە بۆ تەئکیدکردنەوەیە ئەگەرنا لە ئەلیفو بێی عەقیدەی ئینسانی مسوڵمان دایە کە خوا هەموو شتێك دەزانێت، بەڵام خوا بیرمان دەخاتەوە کە بە هەموو شتێك زانایە، تۆ حاڵەتێك دەبینی خوا هەموو حاڵەتەکان دەبینێ، تۆ شتێك دەبینی خوا هەموو شتەکان دەبینێ، تۆ کەسێك دەناسی، خوا هەموو کەسەکان دەناسێ، جاری وا هەیە کابرا دەڵێ: کاکە نووسینی بۆچییە ؟ هەر عەیبە بینووسین ! کەچی دوایی هەر ئەو کەسەی کە پێت عەیب بوو قەرزەکەی لەگەڵدا بنووسی، تەماشا دەکەی تووشی گەورەترین کێشەو سەرئێشەت دەکات، شتی وا زۆر بووەو، خوای زاناو شارەزا هەر خۆی باش دەزانێ.

**مەسەلەی بیستو سێیەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ وَإِن كُنتُمْ عَلَىٰ سَفَرٍ وَلَمْ تَجِدُوا كَاتِبًا فَرِهَٰنٌ مَّقْبُوضَةٌ ﴾، وە ئەگەر لە سەفەربوون نووسەرتان دەست نەکەوت، با چەند بارمتەیەکی وەرگیراوتان هەبێ، لەجیاتی نووسین، بۆ ئەوەی کە ئەو قەرزە، یاخود ئەو مامەڵەیەی بە قەرز دەکرێ کێشەو سەر ئێشەی تێدا پەیدانەبێ، وشەی (رِهَان) کۆی (رَهْن)ە، هەروەك (رهُون)یش کۆی (رَهْنَ)ە، وە (رَهْن) چاوگە، بەڵام دوایی کراوە بە ناو، بە کوردی واتە: بارمتە، پێناسەی (رَهْن)یشمان پێشتر کرد، ئەوەیە کە یەکێك ئەندازەیەك پارە دەدا بە کەسێكو لە بەرانبەردا شتێکی لێوەردەگرێ، سەیارەیە، خانوویە، زەوییە، شتێکی لێوەردەگرێ کە ئەو شتە لە لای بابای پارەدەر دەبێ، هەتاکو بابای پارە وەرگر لە کاتی خۆیدا، ئەو قەرزەی کە وەریگرتوە دەیداتەوە، ئەویش ئەو کاتە شتەکە تەسلیم دەکاتەوە، کە ئەوەش وردەکاریی زۆری هەیەو ئێمە لەم دەرسی تەفسیرەدا ناتوانین بچینە نێو ئەو وردەکارییانەوە کە شەرعزانان لە کتێبەکانی خۆیاندا باسییان کردوە، جا خوا لێرەدا کە دەفەرموێ: ﴿ وَإِن كُنتُمْ عَلَىٰ سَفَرٍ وَلَمْ تَجِدُوا كَاتِبًا ﴾، زانایان گوتوویانە: لێرەدا خوای کاربەجێ هەرچەندە باسی سەفەری کردوە، بەڵام مانای وانیە ئەگەر ئینسان لە سەفەر نەبوو نابێ مامەڵە بە ڕەهن بکات لە بەرانبەر قەرزدا، بەڵکو لە سەفەرو لەماڵی (حَضَرْ) ئەوە هەر دەکرێ، بەڵێ (موجاهید) کە یەکێکە لە زانایانی تابعین گوتوویەتی: ئەمە تایبەتە بە سەفەرەوە، بەڵام هەموو زانایانی دیکە گوتوویانە: نەخێر تایبەت نیە بە سەفەرەوە، بەڵکو خەڵك لە ماڵی خۆیشییان بن، بۆیان هەیە بەو جۆرە پێکەوە مامەڵە بکەنو، لە بەرانبەری قەرزدا ڕەهن وەربگرن، ئەدی بۆچی خوا باسی سەفەری کردوە ؟! (فَخْرَالدین الرازي) لە تەفسیری خۆی (التَّفسیر الكَبیر)[1]دا، دەڵێ: (وَإنَّما تَقَيَّدَت الآيةُ بِذِكرِ السَفَرِ عَلى سَبيل الغالِب)

---

١) (مفاتيح الغَيْب، التفسير الكبير)، ج: (٤)، ص: (١١٨).

واتە: بۆیە ئایەتەکە باسی سەفەری کردوە، چونکە بە زۆریی وایە مامەڵە بە ڕەهن لە سەفەردا دەبێتو، لە سەفەردا دەبێ کە نووسەرو قەڵەمو کاغەزو ئامرازی نووسینیان دەست ناکەوێو تۆمار (تَسجیل)کردنیان بۆ ناگونجێ، بۆیە خوا وایفەرموە، ئەگەرنا تایبەت نیە بە سەفەرەوە، هەروەك چۆن ئایەتی ژمارە (١٠١) لە سورەتی (النساء)دا کە باسی کورتکردنەوەی نوێژ دەکات دەفەرموێ: ﴿ وَإِذَا ضَرَبْتُمْ فِي ٱلْأَرْضِ فَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَن تَقْصُرُوا۟ مِنَ ٱلصَّلَوٰةِ إِنْ خِفْتُمْ أَن يَفْتِنَكُمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ ... ﴾، واتە: ئەگەر بە ڕێگادا بەسەفەر چوونو ڕۆیشتن، وە ترستان هەبوو کە ئەوانەی بێبڕوان تووشی ئازارتان بکەن، گوناهتان ناگاتێ کە نوێژەکانتان کورت بکەنەوە، ئەدی ئەگەر کابرا ترسی نەبوو لە دوژمن، ئایا بۆی نیە نوێژەکەی کورت بکاتەوە ؟ زانایان: دەڵێن با، وە هەموویان لە سەر ئەوە یەکدەنگن، ئەدی بۆچی لێرەدا فەرموویەتی: ﴿إِنْ خِفْتُمْ أَن يَفْتِنَكُمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ ﴾، دەڵێن: چونکە بە زۆریی وایە کە ئینسان لە ماڵی دەچێتە دەر، ئەو کاتە ئەو هەلومەرجو جەوەکە ئایەتەکەی تێدا هاتۆتە خوار، دێتە دی، وە بە زۆریی وا بووە کە مسوڵمانان لە ماڵ دەرچوون، لەبەر ئەوەی لە حاڵەتی جەنگ دابوون، تیرەو هۆزە کافرەکانو ڕۆمو فارس شەڕیان پێ فرۆشتوونو هەمیشە کە لە ماڵ چوونەدەر ترسی دوژمنیان هەبووە، خوای پەروەردگار بەپێی حاڵەتی باوی ئەو کاتە ئەو باسی ترسەی هێناوەتە پێشێ، ئەگەرنا مرۆڤ ئەگەر ترسیشی نەبێ لە دوژمن، هەر بۆی هەیە نوێژ کورت بکاتەوە، بە هەمان شێوە ئەگەر لە سەفەریش نەبێ، مسوڵمانان هەر بۆیان هەیە لە بەرانبەری قەرزدا بارمتە وەربگرن.

**مەسەلەی بیستو پێنج:** کە دەفەرموێ: ﴿ فَرِهَٰنٌ مَّقْبُوضَةٌ ﴾، چەند بارمتەیەکی وەرگیراو، بارمتە وەرگیراوەکان، واتە: بارمتە وەرگیراوەکان قەرەبووی نووسینی قەرز دەکەنەوە، زۆربەی زانایان ڕایان وایە کە دەبێت ئەو

بارمتەیە تەسلیمی بابای قەرزدەر بکرێ، بۆچی ؟ چونکە دەفەرموێ: ﴿ فَرِهَٰنٌ مَّقْبُوضَةٌ ﴾، بارمتەیەکی وەرگیراو (مَقْبُوض) واتە: (مَأخوذ) وەرگیراو، قەرزدەرەکە پێی دەگوترێ: (مُرْتَهِن) واتە: ڕەهن وەرگر، وە بابای ڕەهندەریش پێی دەگوترێ: (رَاهِن) واتە: شتەکەی خۆی خستۆتە ڕەهنەوە، بۆ نموونە: خانووەکەی خستۆتە ڕەهنەوە، ئنجا ئایا بۆچی خوا دایناوە کە دەبێ بابای قەرزدەر شتەکەی تەسلیم بکرێ ؟ چونکە ئەگەر شتەکە لەبەر دەستی بابای بارمتە وەرگر (مُرْتَهِن) بێ، کابرای بارمتەدەر (رَاهِن)و قەرز وەرگر، لەوانەیە نکوولّیی لێ بکاتو بڵێ: نەخێر قەرزت نەداوە بە من، ئەویش دەستێکی دەکەوێتە ئەملاو یەکی دی دەکەوێتە ئەو لاو ئاسمان دوورو زەوی سەخت ! بەڵام کە شتەکە لای ئەوبێو لە ژێر کۆنترۆڵی ئەو دابێ، جا خانوویە، یان هەر شتێکی دیکەیە، ئەو کاتە دەڵێ: ئەگەر ڕاست دەکەی قەرزدارم نی، ئەدی تۆ ئەو شتەت بۆ هاتۆتە دەستی من ؟!

<u>**مەسەلەی بیستو شەش:**</u> کە دەفەرموێ: ﴿ فَإِنْ أَمِنَ بَعْضُكُم بَعْضًا فَلْيُؤَدِّ ٱلَّذِى ٱؤْتُمِنَ أَمَٰنَتَهُۥ ﴾، شەریعەتی خوای پەروەردگار واقیع بینەو دەزانێ هەموو جارێ ئەو خەڵکە بۆ مامەڵەکردن پێکەوە، وانیە کە لێك لە گوماندا بنو مەترسیی کێشەو سەر ئێشەیان لەگەڵ یەکدیدا هەبێ، بۆیە حیسابی ئەو حاڵەتەشی کردوەو دەفەرموێ: جا ئەگەر هەندێکتان لە هەندێکتان دڵنیابوون، یانی: قەرزەکەتان نەنووسیو شایەدتان بۆ نەگرتو ڕەهنتان لە بەرانبەردا وەرنەگرت ﴿ فَلْيُؤَدِّ ٱلَّذِى ٱؤْتُمِنَ أَمَٰنَتَهُۥ ﴾، با ئەو کەسەی کە سپاردەکەی پێدراوە، بیداتەوە، نافەرموێ: (فَلْيُؤَدِّ الْمَدِينُ دَيْنَهُ) با قەرزدارەکە قەرزەکەی بداتەوە، وا نافەرموێ: دەنا خۆی ئەسڵ وایە، بەڵکو دەفەرموێ: با ئەو کەسەی کە بە ئەمیندار دانراوە، سپاردەکە تەسلیم بکاتەوە، چونکە مادام بابای قەرزدەر متمانە بە بابای قەرز وەرگر دەکاتو، ڕەهنی لێ وەرناگرێو، شایەدیی

لێ‌ناگرێ‌و نایینووسێ، مانای وایە بە کەسێکی باشی داناوەو بە ئەمینداری داناوە، کەواتە: با ئەویش بەپێی گومانی خاوەن قەرزبێ‌و، ئەو سپاردەیەی کە لەلایەتی لەکاتی خۆیدا تەسلیمی بابای متمانەکەرو قەرز پێدەری بکاتەوە.

شایانی باسیشە هەندێك لە زانایان گوتوویانە: ئەم ڕستە قورئانییە ئەوەی پێشێی نەسخ کردۆتەوە، دیارە هەندێك لە زانایان‌و توێژەروان عادەتیان وابووە، هەر خوا خوایان بووە ڕستەیەکی قورئانیان لێ هەڵکەوێ‌و بە ڕواڵەت لەگەڵ ئەوی دیکە تێکبگیرێ، بۆ ئەوەی بڵێن: ئەوەی دووەمیان ئەوەی یەکەمیانی (نَسْخ) کردۆتەوە ! کە ئێمە لە دەرسەکانی ڕابردوودا گوتوومانە: لە قورئاندا (نَسْخ) هەر نیەو هیچ ڕستەیەکی قورئان هیچ ڕستەیەکی دیکەی (نَسْخ) نەکردۆتەوە، ئنجا ئەگەر تەماشا ئەم مەسەلەیە بکەین بەمجۆرەیە:

کاتێك بابای قەرز پێدەر دوو دڵەو گومانی هەیە لە بابای قەرز وەرگر، دەینووسێ‌و شایەدیی لێ دەگرێ، ئەگەر نووسین نەبوو، ڕەهنێکی لێ وەردەگرێ، بۆچی ؟ چونکە لێی لە گوماندایە، یاخود ئەگەری ئەوە دادەنێت کە دوایی سەرئێشەو کێشەیان لە بەیندا پەیدابێ، ئەدی ئەگەر گومانی نەبووو هیچ ئەگەری نەبووو پێویستی نەکرد بینووسێ‌و، پێویستی نەکرد شایەدی لێ بگرێ‌و، پێویستی نەکرد ڕەهن وەربگرێ، ئایا ئەو دوو حاڵەتە لە یەك جیا نین ؟! بێگومان، با، خوای پەروەردگار ئەوەی پێشێی بۆ کاتێك فەرموە، کە متمانە لە بەیندا نەبێ، یاخود ئەگەری پەیدابوونی کێشەو سەرئێشە هەبێ‌و ئەوەی دووەمیشی بۆ کاتێك فەرموە کە متمانە هەبێ‌و ئەگەری پەیدابوونی کێشەو سەر ئێشە نەبێ، کەواتە: دوو حاڵەتی لێك جیان، وە دوو حوکمی لێك جیایان هەیە، (نەسخ)یش کاتێك دروست دەبێ کە دوو دەقی قورئان، یاخود دوو فەرمایشتی پێغەمبەر ﷺ تێکبگیرێن‌و، نەگونجێ لە یەك کاتدا جێبەجێ بکرێن، بەڵام لێرەدا دەگونجێ هەردووکیان لە یەك کاتدا جێبەجێ بکرێن، ئەوەی پێشێ کە دەفەرموێ: بینووسن‌و شایەدی لێ بگرن، یاخود ڕەهن وەربگرن، لە کاتێکدایە کە گومان لە یەکدی بوون هەبێ‌و، متمانە وەك پێویست نەبێ‌و، ئەگەری پەیدابوونی کێشە

هەبێ، ئەویدیکەش لە کاتێکدایە کە ئەو ئەگەرو دوو دڵییانە نەبن، کەواتە: لە یەك کاتدا هەردووکیان، بەڵام لە دوو حاڵەتی جیادا جێبەجێ دەکرێن، بۆیە مەسەلەی (نَاسِخ)و (مَنْسُوخ) لەگۆڕێدا نیە.

**مەسەلەی بیستو حەوتەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تَكْتُمُواْ ٱلشَّهَٰدَةَ ﴾، وە شایەدیی مەشارنەوە، هەندێك لە زانایان گوتوویانە: مەبەست پێی شایەدەکانن، واتە: شایەدەکان با ئەو شایەدییەی کە لە لایانە نەیشارنەوە.

هەندێکی دیکەشیان گوتوویانە: مەبەست پێی بابای قەرز وەرگرە، واتە: ئەوەی کە هەقەکەی لە لایە، با ئەو شایەدییە کە لەلایەتی، نەیشارێتەوەو نکووڵیی لەو هەقە نەکات کە لەلایەتی، بەڵام من پێم وایە ئایەتەکە هەمووان دەگرێتەوە، چونکە بەگشتی فەرموویەتی: ﴿ وَلَا تَكْتُمُواْ ٱلشَّهَٰدَةَ ﴾، هیچ کامتان شایەدیی مەشارنەوەو ئەو هەقەی کە دەیزانن مەیشارنەوەو ژێر لێوی مەخەنو نکووڵیی لێ مەکەن، وە پێغەمبەر ﷺ لەوبارەوە فەرموویەتی: {(أَلاَ أُخْبِرُكُمْ بِخَيْرِ الشُّهَدَاءِ الَّذِي يَأْتِي بِشَهَادَتِهِ قَبْلَ أَنْ يُسْأَلَهَا) (رَوَاهُ مسلم برقم: (١٤٦٩)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٣٥٩٦)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٢٢٩٥)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٥٠٧٩) عَنْ زَيْدِ بْنِ خَالِدٍ الْجُهَنِيِّ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ}، واتە: ئایا هەواڵتان نەدەمێ بە باشترینی شایەدەکان ؟! ئەو کەسەی کە شایەدیی دەدات بەرلەوەی داوای شایەدییدانی لێ بکرێ، یەکێك ئاگای لە شتێکە بچێ بڵێ: من دێم شایەدیی دەدەم (أَشْهَدُ بِاللهِ) ئەو شتە بەو شێوەیە بوو، ڕێكو ڕاست با شایەدییەکەی بدا، نەك تەکلیفو داوای لێ بکرێ، هەڵبەتە کە تەکلیفو داوای لێ دەکرێ، ئەو کاتە لەسەری پێویست دەبێ، وەك پێشتر باسمان کرد.

**مەسەلەی بیستو هەشتەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ وَمَن يَكْتُمْهَا فَإِنَّهُۥٓ ءَاثِمٌ قَلْبُهُۥ ﴾ هەر کەسێك شایەدیی بشارێتەوە، دڵی گوناهبارە، پێشتریش باسمکرد، کە بۆچی خوا ﷻ باسی دڵ دەکات، خۆ ئەو ئینسانە کە گوناهبارە، بە قەڵبو

قالْبەوە، بە ڕووحو جەستەوە گوناهبارە؟ چونکە لەڕاستیدا ئەوەی کە هەڵسووڕێنەری ئینسانەو جووڵێنەریەتیو کانگای بڕیارە، بریتیە لە دڵو دەروونی، بۆیەش خوا ﷻ دەفەرموێ: کەسێك شایەدیی بشارێتەوە عەینی نێو دڵی گوناهبارە، جا ئەگەر ئینسان نێو دڵی گوناهبار بوو، مانای وایە ئاو لە سەرچاوەوە لێڵە! وە پێغەمبەر ﷺ لە فەرمایشتێکدا فەرموویەتی: {(أَلاَ إِنَّ فِي الجَسَدِ مُضْغَةً إِذَا صَلَحَتْ صَلَحَ الجَسَدُ كُلُّهُ، وَإِذَا فَسَدَتْ فَسَدَ الجَسَدُ كُلُّهُ أَلاَ وَهِيَ القَلْبُ) (رَوَاهُ البُخَارِيُّ برقم: (٥٢)، وَمسلم برقم: (٤٠٧٠)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (١٢٠٥)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٣٩٨٤)، عَنِ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ رضي الله عنه}، واتە: ئاگادار بن! لە جەستەدا پارچەیەك هەیە، ئەگەر چاکبوو جەستە هەمووی چاك دەبێو ئەگەر خراپ بوو جەستە هەمووی خراپ دەبێ، ئەویش دڵە، بەڵێ لە ڕاستیدا ئینسان لە دڵو دەروونەوە بەرەو خێرو چاکە، یان بەرەو شەڕو خراپە دەچێ.

خوا بە لوتفو کەرەمی خۆی لەو کەسانەمان بگێڕێ کە دڵێکی ساغو سەلامەتو بێ غەڵو غەشیان هەیە، وەك بۆخۆی دەفەرموێ: ﴿يَوْمَ لَا يَنفَعُ مَالٌ وَلَا بَنُونَ ﴿٨٨﴾ إِلَّا مَنْ أَتَى اللَّهَ بِقَلْبٍ سَلِيمٍ ﴿٨٩﴾﴾ الشعراء، واتە: ڕۆژێك کە نە ماڵو سامان نە کوڕان، داد نادەنو سوود ناگەیەنن بە خاوەنەکەیان، مەگەر کەسێك بە دڵێکی ساغەوە بێ، دڵی ساغیش ئەوەیە کە شیرکو کوفرو نیفاقی تێدانەبێ بەرانبەر بە خواو، بەرانبەر بە خەڵكو مسوڵمانان درۆو غەشو خیانەتی تێدانەبێ.

**مەسەلەی بیستو نۆیەمو کۆتایی:** کە دەفەرموێ: ﴿وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ عَلِيمٌ﴾، وە خوا بەوەی کە ئەنجامی دەدەن زانایە، بۆ زانیارییتان وشەی: ﴿تَعْمَلُونَ﴾، (ئەنجامی دەدەن) زۆر لە توێژەرەوان هەروایان لێکداوەتەوە کە مەبەست لە (عمل) تەنیا ئەو کردەوەیە کە بە ئەندامەکان ئەنجام دەدرێو جێبەجێ دەکرێ، بەڵام ئەگەر تەماشای قورئان بکەین خوای بەرزو مەزن وشەی (عَمَل) هەم بۆ

نیەتی نێوو دڵو هەم بۆ دەربڕینی زمانو هەم بۆ جموجۆڵی ئەندامەکانیش بەکاردێنێ، کەواتە: ﴿ وَٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ عَلِيمٌ ﴾، یانی: ئەوەی کە ئەنجامی دەدەن، بە دڵتان، بە زمانتان، بە ئەندامەکانتان، کەواتە: بزانن دڵتان چی تێدایەو بە زمان چی دەڵێن، وە بە ئەندامەکانیشتان چۆن هەڵسوکەوت دەکەن، چونکە خوای پەروەردگار بە هەمووی زانایەو هیچی لێ پەنهان نیە.

خوا بە لوتفو کەرەمی خۆی لەو کەسانەمان بگێڕێ کە دڵو زمانو ئەندامەکانیان تەنیا بەرەو شەرع دەجووڵێن، وە لە شێرازەی شەرع دەرناچن، وە لەو کەسانەمان بگێڕێ کە خاوەنی دڵێکی ساغو زمانێکی ڕاستو جەستەیەکی فەرمانبەری شەرعن.. ئامین.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی پەنجاو هەشتەمین

## پێناسەی ئەم دەرسە

خوا پشتیوان بێت لەم دەرسەماندا کە دەرسی کۆتایی یە لە تەفسیرو لێکدانەوەمان بۆ سوورەتی (البقرة)، سێ ئایەتی کۆتایی لە سوورەتی (البقرة)دا دەتوێژینەوە، کە ئایەتەکانی ژمارە: (٢٨٤و ٢٨٥و ٢٨٦)ن، لەم سێ ئایەتە بەپێزەدا خوا ﷻ باسی خاوەندارێتی خۆی دەکات بۆ ئاسمانەکانو زەوی، وە ئەوە کە خوا پەنهانبینەو هەموو شتێك دەزانێتو ئاگای لەئاشکراو نهێنی هەیەو، لێپرسینەوەش لەگەڵ بەندەکانیدا دەکات، لەسەر ئەوەی کە ئاشکرای دەکەنو ئەوەش کە پەنهانی دەکەن، وە پاشان باسی ئیمانی پێغەمبەر ﷺ وە بڕوادانی شوێنکەوتووی دەکات، بەو شتانەی کە پێویستە ئیمانیان پێی هەبێ، کە ئیمانە بە خواو فریشتەکانیو کتێبەکانیو پێغەمبەرەکانی، وە پاشان باسی ئەوە دەکات کە ئینسان شەریعەت لێی داوا ناکات جگە لەوەی کە لە توانایدا هەبێت، وە باسی نزاو پاڕانەوەی بڕواداران دەکات لە خزمەت خوای پەروەردگاردا، وە ئەم سێ ئایەتە بەپێزە وەك دوایی باسی دەکەین کۆمەڵێك فەرمایشتی پێغەمبەریان ﷺ لەسەرن، بەتایبەتی دوو ئایەتی کۆتاییو گرنگییو بایەخیی تایبەتییان هەیە.

﴿لِّلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلْأَرْضِۗ وَإِن تُبْدُواْ مَا فِيٓ أَنفُسِكُمْ أَوْ تُخْفُوهُ يُحَاسِبْكُم بِهِ ٱللَّهُۖ فَيَغْفِرُ لِمَن يَشَآءُ وَيُعَذِّبُ مَن يَشَآءُۗ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٖ قَدِيرٌ ﴿٢٨٤﴾ ءَامَنَ ٱلرَّسُولُ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيْهِ مِن رَّبِّهِۦ وَٱلْمُؤْمِنُونَۚ كُلٌّ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَمَلَٰٓئِكَتِهِۦ وَكُتُبِهِۦ وَرُسُلِهِۦ لَا نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٖ مِّن رُّسُلِهِۦۚ وَقَالُواْ سَمِعْنَا وَأَطَعْنَاۖ غُفْرَانَكَ

رَبَّنَا وَإِلَيْكَ ٱلْمَصِيرُ ﴿٢٨٥﴾ لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا ۚ لَهَا مَا كَسَبَتْ وَعَلَيْهَا مَا ٱكْتَسَبَتْ ۗ رَبَّنَا لَا تُؤَاخِذْنَآ إِن نَّسِينَآ أَوْ أَخْطَأْنَا ۚ رَبَّنَا وَلَا تَحْمِلْ عَلَيْنَآ إِصْرًا كَمَا حَمَلْتَهُۥ عَلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِنَا ۚ رَبَّنَا وَلَا تُحَمِّلْنَا مَا لَا طَاقَةَ لَنَا بِهِۦ ۖ وَٱعْفُ عَنَّا وَٱغْفِرْ لَنَا وَٱرْحَمْنَآ ۚ أَنتَ مَوْلَىٰنَا فَٱنصُرْنَا عَلَى ٱلْقَوْمِ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٢٨٦﴾ ﴾

## مانای وشە بە وشەی ئایەتەكان

((هەرچی لە ئاسمانەكان‌و زەویدایە هی خوایە، وە ئەگەر ئەوەی لە دەروونتان دایە، دەریبخەن یان پەنهانی بكەن خوا (دەیزانێ‌و) لەسەری لێپرسینەوەتان لەگەڵدا دەكات، جا هەركەس بیەوێ دەیبوورێ‌و هەركەسێكیش بیەوێ ئازاری دەدا، وە خوا لەسەر هەموو شتێك بەتوانایە ﴿٢٨٤﴾ پێغەمبەرو بڕواداران بڕوایان بەوە هێناوە كە لە پەروەردگارییەوە بۆی نێرراوەتە خوار، هەركامێكیان بڕوای بە خواو فریشتەكانی‌و كتێبەكانی‌و ڕەوانەكراوانی هێناوە (دەڵێن): جیاوازیی ناخەینە نێوان هیچ كام لە پێغەمبەرانییەوە، وە گوتیان: بیستمان‌و فەرمانبەرییمان كرد، پەروەردگارمان ! لێبوردنت داوا دەكەین سەرەنجام هەر بۆ لای تۆیە ﴿٢٨٥﴾ خوا جگە لە توانای لە هیچكەس داوا ناكات، هەموو كەس لەو چاكانەی دەیانكات بەهرەمەندو، لەو خراپانەی دەیانكات زەرەرمەندە، پەروەردگارمان هەركات لەبیرمان چوو، یان هەڵەمان كرد لێمان مەگرە، پەروەردگارمان ! وە قورساییەك وەك ئەوەی خستووتە سەر (شانی) ئەوانەی پێشوومان، مەخە سەرشانمان، پەروەردگارمان وە ئەركێكمان ماوێ سەر كە لە وزەماندا نیە، وە بمانبەخشەو بمانبوورەو بەزەییت پێماندابێ، هەر تۆ پشتیوانمانی، جا بەسەر كۆمەڵی كافراندا سەرمان بخە ﴿٢٨٦﴾)).

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

**(أَنفُسِكُمْ)**: کە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿وَإِن تُبْدُوا مَا فِي أَنفُسِكُمْ أَوْ تُخْفُوهُ يُحَاسِبْكُم بِهِ اللَّهُ﴾، (أَنفُس) کۆی (نَفْس)ە، (نَفْس)یش بە مانای ڕووح دێت، وە بە مانای (ذَات) دێت (النَّفْسُ: الرُوحُ، والنَّفْسُ: الذَات) خوا ﷻ مەبەستی ئەوەیە کە ئەوەی لە دەروونتاندا هەیەو لە دیوی پەنهانتاندایە، پەنهانی بکەن یاخود دەریبخەن لەسەر جەستەتان، لێپرسینەوەتان لەگەڵ دەکات.

**(يُحَاسِبْكُمْ)**: (يُنَاقِشُكُم، يُجَازِيكُمْ) واتە: لێتان دەپرسێتەوەو وە سزاو پاداشتتان دەداتەوە.

**(فَيَغْفِرُ)**: واتە: دەبووری (الغفر: الستر)، واتە: پۆشین (الغَفْرُ: إلْبَاسُ الشَّيءِ ما يَصُونُهُ عَنِ الدَّنَسِ، والْغُفْرَانُ وَالمَغْفِرَةُ مِنَ اللهِ هُوَ أَنْ يَصُونَ العَبْدَ مِنْ أَنْ يَمَسَّهُ العَذَابُ)، (غَفْر) بریتیە لەوە کە شتێک بە شتێک داپۆشی کە لە چڵکن بوون بیپارێزێ، (غفران) و (مغفرة)ش لە خواوە ئەوەیە کە بەندەی خۆی لەوە بپارێزێ کە سزاو ئازاری تووش بێ، (مِغْفَرْ)یش بۆیە وای پێدەگوترێ، چونکە سەری ئینسان دادەپۆشێ.

**(وَيُعَذِّبُ)**: (العَذَابُ: الإيجَاعُ الشَّدِيدُ) بریتیە لە ئازار پێگەیاندنی توند (يُعَذِّبُ) واتە: ئازار دەدا، سزا دەدا.

**(سَمِعْنَا)**: واتە: بیستمان، بەڵام لێرەدا یانی: (فَهِمْنَا) تێگەیشتین، وەرمانگرت (وأطعنا وارتَسَمْنَا وائتَمَرْنا) واتە: فەرمانبەرییمان کردو جێبەجێمان کرد.

**(لَا يُكَلِّفُ اللَّهُ نَفْسًا)**: واتە خوا ﷻ لە هیچ کەسێک داوا ناکا دەڵێ: (التَّكَلُّفُ: اسْمٌ لِمَا يُفْعَلُ بِمشَقَّةٍ أو تَصَنُّعٍ، كَلَّفَهُ: أَوجَبَهُ عَلَيهِ وَأَلْزَمَهُ بِهِ) (تَكَلُّفُ) لەسەر کێشی (تَفَعُّل)ە، ناوە بۆ هەر شتێک کە بەزەحمەت بکرێ، یاخود بە

شێوەیەکی ساختە بکرێ، وە (كَلَّفَهُ) واتە: لەسەری پێویست کردو پابەندی کرد بەو شتەوە.

(وُسْعَهَا): (الوُسْعُ: مِنَ القُدْرَةِ: مَا يَفْضُلُ عَنْ قَدْرِ المُكَلَّفِ) واتە: (وُسْع) ئەوەیە کە لە توانای ئینسان زیاد نەبێ، یانی: ئەوەیە کە ئینسان بۆی ئەنجام بدرێو، وانیە کە لە بڕستی ئینسان زیاد بێ.

(كَسَبَتْ): (الكَسْبُ: مَا يَتَحَرَّاهُ الإنسَان مِمَّا فيهِ اجتِلاَّبُ نَفْعٍ وتَحْصِيلُ حَظٍّ) واتە: (كَسْب) هەر شتێکە کە مرۆڤ لێی دەخەفتێو سوودێکی لێ وەدەست دێنێ، یاخود ئامانجێکی خۆی پێ جێبەجێ دەکا، لێرەدا وشەی: (كَسْب) ﴿لَهَا مَا كَسَبَتْ﴾، بۆ کردەوەی باش بەکارهاتوە، واتە: هەر کردەوەیەکی باش کە ئینسان ئەنجامی دەدا، سوودەکەی بۆخۆیەتی ﴿وَعَلَيْهَا مَا اكْتَسَبَتْ﴾، (الإكتساب كَالكَسب) واتە: (إكتِسَاب) وەك (كَسْب)ە، هەردووکیان یانی: وەدەستهێنان، خوای پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿لِّلرِّجَالِ نَصِيبٌ مِّمَّا اكْتَسَبُوا وَلِلنِّسَاءِ نَصِيبٌ مِّمَّا اكْتَسَبْنَ...﴿٣٢﴾﴾ النساء، پیاوان ئەوەی کە وەدەستیان هێناوە لە کارو کەسابەت پشكو بەشی خۆیانیان هەیە، ئافرەتانیش بەهەمان شێوە (وَلَكِن هُنَا يُقْصَدُ بِهِ السيئات)، بەڵام لێرەدا مەبەست لە ﴿وَعَلَيْهَا مَا اكْتَسَبَتْ﴾، واتە: ئەوەی کە وەدەستی دێنێ لە خراپە، ئنجا بۆچی خوا ﷻ وشەی (كَسَبَتْ)ی بۆ چاکە بەکارهێناوەو، وشەی (اكْتَسَبت)ی بۆ خراپە ؟ چونکە چاکە لەگەڵ فیطرەتو سروشتی ئینساندا گونجاوترەو ئاسانتر بۆی ئەنجام دەدرێ، بەڵام خراپەی بە زەحمەت بۆ ئەنجام دەدرێ، وەك چۆن وشەی (اكْتَسَبت) لە وشەی (كَسَبَتْ) قورسترە لەسەر زمانو دوو پیتی زیاترن.

(لَا تُؤَاخِذْنَا): واتە: سزامان مەدە، لێمان مەگرە.

(أَخْطَأْنَا): (الخَطَأُ: العُدُولُ عَنِ الجِهَةِ)، (خطأ) بریتیە لە لادان لەو ئاڕاستە ڕاستەی کە پێویستە ئینسان بەرەو ڕووی بڕوا، جا دوو وشە هەن (خَطِيءَ، يَخْطَأُ، خِطْئاً) و (أَخْطَأَ، يُخْطِئُ خَطَأً)، (خَطِيءَ) واتە: گوناهی کرد، فەرموویەتی: ﴿إِنَّ قَتْلَهُمْ كَانَ خِطْـًٔا كَبِيرًا ۝﴾ الأسراء، (خِطْئاً) واتە: گوناح، بەڵام (وأَخْطَأَ، يُخْطِئُ خَطَأً)، (أَخْطَأَ) واتە: هەڵەی کرد (يُخْطِيءُ) هەڵە دەکات (خطأ) واتە: هەڵە، شتێکە کە ئینسان لەسەری گوناهبار نیە، چونکە بە هەڵە دەیکات نەك بە ئەنقەست، بەڵام (خِطْأ) گوناهێکە بە ئەنقەست بیکات.

(إِصْرًا): (الإِصْرُ: عَقْدُ الشَّيءِ، وَحَبْسُهُ بِقَهرٍ، وَقِيلَ: ثقِلاً)، (إصر) بریتیە لە گرێدانی شتێك، شتێك بە تۆبزیی بهێڵیەوە، وە بەمانای قورساییش دێت (والإِصْرُ العَهْدُ المُؤكَّدُ الَّذي يُثَبِّطُ نَاقِضَهُ عَنِ الثَّوَابِ والخَيْرَاتِ)، وە (إصر) بە پەیمانێکی داکۆکیی لەسەرکراو دەگوترێ، کە هەر کەسێ هەڵیبوەشێنێتەوە خاوەنەکەی لە پاداشتو لە چاکە دوا دەخا.

(تُحَمِّلْنَا): کە خوا دەفەرموێ: ﴿رَبَّنَا وَلَا تُحَمِّلْنَا مَا لَا طَاقَةَ لَنَا بِهِۦ﴾، واتە: مەیخە سەرشانمان، لێمان داوامەکە (يُقَالُ: حَمَّلْتُهُ كَذَا فَحَمَلَهُ وَحَمَّلت عَلَيهِ كَذا...) واتە: ئەو شتەم خستە سەرشانی، یان ئەو شتەم لێ بارکرد، کە لێرەدا مەبەست پێی بارکردنی ماددییو بەرهەست نیەو، مەبەست تەکلیف داوا خستنە سەر شانە.

(طَاقَةَ): (الطَاقَةُ: اسْمُ لِمِقْدَارِ مَا يُمْكِن للإِنْسَانِ أنْ يَفْعَلَهُ بِمَشَقَّةٍ وَذَلِكَ تَشْبِيهٌ بالطَّوقِ)، (طَاقَة) لە زمانی عەرەبیدا ناوە بۆ ئەندازەی کردەوەیەك کە ئینسان دەتوانێ بیکات، بەڵام زۆر بەزەحمەت، کە ئەوە وێچواندنە بە ئاڵقەیەك، شتێك کە چۆتە گەردنییەوە.

(وَٱعْفُ عَنَّا): واتە لێمان ببوورە (العَفُو: التَجَافي عَنِ الذَّنبِ، وعَفَوْتُ عَنْهُ: قَصَدتُ إزَالَةَ ذَنْبِهِ صَارِفاً عَنْهُ)، (عَفو) بریتیە لەوە کە ئینسان خۆی لە

گوناهەکە لابدا واتە: کەسێك کە گوناهێکی کرد خوای لێ لابدەی‌و سزای نەدەی، وە (عَفَوْتُ عَنْهُ) واتە: چاوپۆشییم لێکردو یانی: گوناهەکەیم لابرد وەك نەیکردبێ.

(**مَوْلَـٰنَا**): (الوَلي وَالمَولى: النَّصيرُ وَالمُعينُ وَالمُحِبُ وَالقَرِيب، وَهُوَ مِنَ الوَلْيِ: وَهُوَ القُرْبُ)، واتە: وشەی: (مَولى و وَلي) یانی: یاریدەدەرو هاوکارو خۆشویستەرو نزیك، کە لە (ولي)ەوە هاتوەو، ئەویش بەمانای نزیکی.

## هـۆی هاتنــە خوارەوەی ئایەتەکــان

هۆی هاتنە خواری ئایەتەکانی ژمارە: (٢٨٤و ٢٨٥و ٢٨٦) کە دەفەرموێ: ﴿ لِّلَّهِ مَا فِى ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ ۗ وَإِن تُبْدُوا۟ مَا فِىٓ أَنفُسِكُمْ أَوْ تُخْفُوهُ يُحَاسِبْكُم بِهِ ٱللَّهُ ۖ فَيَغْفِرُ لِمَن يَشَآءُ وَيُعَذِّبُ مَن يَشَآءُ ۗ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿٢٨٤﴾ ﴾، {(عَنْ أَبِي هُرَيرَةَ رضي الله عنه، قَالَ لمَاَّ نَزَلَتْ عَلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ: ﴿ لِّلَّهِ مَا فِى ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ ... ﴾، قَالَ: فَاشْتَدَّ ذَلِكَ عَلَى أَصحَابِ رَسُولِ اللهِ ﷺ، فأتوا رَسُولَ اللهِ ثُمَّ بَرَكُوا عَلَى الرُّكَبِ فَقَالُوا أَيْ رَسُولَ اللهِ كُلِّفْنَا مِنَ الأَعْمَالِ مَا نُطِيقُ: الصَّلَاةَ، والصِّيَام، والجِهَادَ، والصَّدَقَةَ، وَقَدْ أُنزِلَتْ عَلَيْكَ هَذِهِ الآيةُ، فَلاَ نُطِيقُهَا، قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: أَتُرِيدُونَ أنْ تَقُولُوا كَمَا قَالَ أَهْلُ الكِتَابَيْنِ مِنْ قَبْلِكُمْ سَمِعْنَا وعَصَيْنَا ؟! بَلْ قُولُوا: ((سَمِعْنَا وَأَطَعنا غُفرَانَكَ رَبَّنا وَإِليكَ المَصيرُ))، قَالُوا: سَمِعْنَا وَأَطَعنَا غُفرَانَكَ رَبَّنا وَإِلَيْكَ المَصيرُ، فَلَمَّا اقْتَرَأهَا القَوْمُ، ذَلَّتْ بِها أَلْسِنَتُهُمْ فَأَنْزَلَ اللهُ فِي أَثَرِهَا: ﴿ ءَامَنَ ٱلرَّسُولُ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيْهِ مِن رَّبِّهِۦ وَٱلْمُؤْمِنُونَ ... ﴾، فَلَمَّا فَعَلُوا ذَلِكَ نَسَخَهَا اللهُ تَعَالى فَأَنْزَلَ اللهُ ﷻ: ﴿ لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا ۚ لَهَا مَا كَسَبَتْ وَعَلَيْهَا مَا ٱكْتَسَبَتْ ۗ رَبَّنَا لَا تُؤَاخِذْنَآ إِن

نَسِينَآ أَوۡ أَخۡطَأۡنَا ﴾، - قَالَ: نَعَمْ - ﴿ رَبَّنَا وَلَا تَحۡمِلۡ عَلَيۡنَآ إِصۡرًا كَمَا حَمَلۡتَهُۥ عَلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِنَا ﴾، - قَالَ: نَعَمْ - ﴿ رَبَّنَا وَلَا تَحۡمِلۡ عَلَيۡنَآ إِصۡرًا كَمَا حَمَلۡتَهُۥ عَلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِنَا ﴾، - قَالَ: نَعَمْ - ﴿ رَبَّنَا وَلَا تُحَمِّلۡنَا مَا لَا طَاقَةَ لَنَا بِهِۦ ﴾، - قَالَ: نَعَمْ - ﴿ وَٱعۡفُ عَنَّا وَٱغۡفِرۡ لَنَا وَٱرۡحَمۡنَآۚ أَنتَ مَوۡلَىٰنَا فَٱنصُرۡنَا عَلَى ٱلۡقَوۡمِ ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴾، - قَالَ: نَعَمْ -) (رَوَاهُ مسلم برقم: (٣٢٥)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٢٩٩٢)، عن طريق ابن عبَّاس رضي الله عنه}، واتە: ئەبو هورەیرە خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ: دوای ئەوەی ئایەتی: ﴿ لِّلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۗ وَإِن تُبۡدُواْ مَا فِيٓ أَنفُسِكُمۡ أَوۡ تُخۡفُوهُ يُحَاسِبۡكُم بِهِ ٱللَّهُۖ فَيَغۡفِرُ لِمَن يَشَآءُ وَيُعَذِّبُ مَن يَشَآءُۗ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٌ ﴿٢٨٤﴾ ﴾، هاتە خوار، کە دەفەرموێ: هەرچی لە ئاسمانەکانو زەویدایە هی خوایە، وە ئەگەر ئەوەی لە دەروونتاندایە، هەیە پەنهانی بکەن یان ئاشکرای بکەن، خوا لێپرسینەوەتان لەگەڵدا دەکات، جا هەرکەس بیەوێ دەیبووڕێو هەرکەسێکیش بیەوێ سزای دەدا، وە خوا لەسەر هەموو شتێك بە توانایە، هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ ئەو ئایەتەیان زۆر لەسەر دڵ قورس بوو، هاتنە لای پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر ئەژنۆیان (چۆکیان) دانیشتن بەرێزەوەو گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ! ﷺ کردەوەی وامان لەسەر پێویست کراوە، کە دەتوانین ئەنجامی بدەین، وەك: نوێژو، ڕۆژووگرتنو، جیهادو، ماڵ بەخشین (زەکات)، بەڵام ئەم ئایەتەت لەسەر هاتۆتە خوارێ، بۆمان جێبەجێ ناکرێ، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئایا دەتانەوێ وەك خاوەن دوو کتێبەکان {واتە: خاوەن تەوراتو ئینجیل کە جوولەکەکانو نەصرانییەکانن} بڵێن: (سَمِعْنَا وَعَصَيْنَا) بیستمان، بەڵام سەرپێچییمان کرد، {واتە: فەرمانی خوامان وەرگرتو دەزانین خوا چی فەرمووە، بەڵام ئەوە بە قسەشی ناکەین} ئایا ئێوەش دەتانەوێ وابڵێن بەڵکو بڵێن: (سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا غُفْرَانَكَ رَبَّنَا وَإِلَيكَ الْمَصِيرُ)، پەروەردگارمان ! ئەوە فەرمانی تۆمان بیستو وەرمانگرت، وە فەرمانبەرییش دەکەین، جا لێبوردنت داوا

دەکەین، وە سەرەنجامیش بۆ لای تۆ دەگەڕێینەوە، ئەوانیش وایانگوت، جا دوای ئەوەی کە ئەم ئایەتەیان زۆر خوێندەوە ئەو دووعایەیان زۆر کرد تا زمانیان پێوەی ڕاهات، ئنجا خوا ﷻ بە دوایدا ئەم ئایەتەی نارده خوار، کە دەفەرموێ: ﴿ ءَامَنَ ٱلرَّسُولُ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيۡهِ مِن رَّبِّهِۦ وَٱلۡمُؤۡمِنُونَ ... ﴾، خوا ﷻ ئەم ئایەتەی نارده خوارو دوای ئەوەی ئەوەیان کرد، ئنجا خوای بەرز ئەو ئایەتەی پێشێی کە دەفەرموێ: ئەوەی لە دڵتاندایە پەنهانی بکەن یان ئاشکرای بکەن، خوا لێپرسینەوەتان لەگەڵدا دەکات، لای بردو نەسخی کردەوەو، ئەم ئایەتەی نارده خوار: ﴿ لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفۡسًا إِلَّا وُسۡعَهَا ﴾، خوا لە هیچ کەس داوا ناکات مەگەر ئەوەی کە بۆی دەکرێ: ﴿ لَهَا مَا كَسَبَتۡ وَعَلَيۡهَا مَا ٱكۡتَسَبَتۡ ﴾، هەر چاکەیەك بکات بۆی حیسابە، هەر خراپەیەك بکات لەسەری حیسابە ﴿ رَبَّنَا لَا تُؤَاخِذۡنَآ إِن نَّسِينَآ أَوۡ أَخۡطَأۡنَا ﴾، پەروەردگارمان ! ئەگەر لەبیرمان چوو یان هەڵەمان کرد لێمان مەگرە، خوا فەرمووی: بەڵێ لێتان ناگرم، (ئنجا گوتیان:) ﴿ رَبَّنَا وَلَا تَحۡمِلۡ عَلَيۡنَآ إِصۡرًا كَمَا حَمَلۡتَهُۥ عَلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِنَا ﴾، پەروەردگارمان ! وە قورساییەکمان مەخە سەرشان، وەك ئەوە کە خستبووتە سەرشانی ئەوانەی پێشوومان، خوا فەرمووی: بەڵێ ئەرکی واتان ناخەمە سەرشان، کە بۆتان جێبەجێ نەکرێ، (ئنجا گوتیان:) ﴿ رَبَّنَا وَلَا تُحَمِّلۡنَا مَا لَا طَاقَةَ لَنَا بِهِۦ ﴾، پەروەردگارمان ! وە شتێکمان لەسەر پێویست مەکە کە توانامان بەسەریدا نەشکێ، خوا فەرمووی: بەڵێ، (ئنجا گوتیان:) ﴿ وَٱعۡفُ عَنَّا وَٱغۡفِرۡ لَنَا وَٱرۡحَمۡنَآۚ أَنتَ مَوۡلَىٰنَا فَٱنصُرۡنَا عَلَى ٱلۡقَوۡمِ ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴾ وە لێمان ببوورەو بمانپۆشەو بەزەییت پێماندا بێت، تۆ پشتیوانمانیو بەسەر کۆمەڵی کافراندا سەرمان بخە، خوا فەرمووی: بەڵێ.

دیارە دوایی دێمە سەر باسی ئەوە کە ئەم سێ ئایەتەی کۆتایی سوورەتی (البقرة) زۆر شتیان تێدایەو زۆر گرنگن، بۆیە سوننەتە هەرکەسێك چووە سەر

جێگـای خـەوتن، ئـەو سـێ ئایەتـە بخوێنـێ پـێش ئـەوەی خـەوی لێبكـەوێ، وە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر كەسێك دوو ئایەتی كۆتـایی سـوورەتی (البقرة) بخوێنێ، ئەو شەوە بەسنی، جا زانایان سێ واتایان لەو فەرموودەیە وەرگرتوون:

١/ هەندێك لە توێـژەرەوان گوتوویـانە: بەسـنی لەجیاتی شـەونوێـژیش.

٢/ وە هەندێك گوتوویانە: بەسنیو ئەگەر ئەو شـەوە بمرێ بە ئیمانەوە دەمرێ.

٣/ وە هەنـدێكیان گوتوویانـە: بەسـنیو شـەیتانو ژیانـەوەرو ئەوانـە زیـانی پـێ ناگـەیـەنـن.

## مانـای گشـتی ئایەتەكـان

دیـارە سـوورەتی (البقـرة) گـەورەترین سـوورەتی قورئانـەو زۆرتـرین یاسـاكانی شەریعەتی گرتوونە خۆی، وە سـوورەتی (البقرة) وەك لە دەرسەكانی سەرەتای ئـەم زنجیـرە دەرسەدا گوتمان: كاتێك هاتۆتە خوار كە پێغەمبـەر ﷺ خـۆیو هـاوەڵانی بەڕێزی لە مەدینەدا نیشتەجێبوونو دەوڵـەتی ئیسلامییان دامەزراندوە، واتە: ئەم سوورەتە چۆنیەتی دامەزرانـدنی كۆمـەڵگای ئیسلامییو دەوڵـەتی ئیسلامیی تێدا بەرجەستەیە، لەڕووی عەقیدەییو كۆمـەڵایەتیو سیاسییو ئابوورییو ئەخلاقییو عیبادییو پەیوەندییەكانو جەنگو جیهاد، لە هەموو ڕووەكانەوە، جا خوا ﷻ ئەم سوورەتە بەرزو گەورەیە بەو سێ ئایەتـە بـەپێزە كۆتـایی پـێ دێنـێو دەفـەرموێ:

﴿ لِّلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِ ﴾، هەرچـی لـە ئاسمانـەكانو زەویدایـە هـی خوایە، ئایا هیچ كەسێك هەیە خاوەنی هیچ شتێك بێت؟! بەڵێ، ئـەم دەفتـەرە هی منە، ئەم كامێرایە هی تۆیە، ئەم فلان شتە هی ئەوە، بەڵام خاوەندارێتـی ئێمـە بـۆ شـتەكان خاوەندارییەكی كەمو كاتییە، ئێستا هی تۆیە پێش ئێستا هی تـۆ نـەبووە، وە دواییش كە تۆ دەڕۆی لەدەستی تۆدا نامێنـێو هی تۆ نامێنی.

پاشان تۆ خۆتو ئەوەش كە هەتە خاوەنێكتان هەیە ئەویش خوای پەروەردگـارە ﴿ وَإِن تُبۡدُواْ مَا فِيٓ أَنفُسِكُمۡ أَوۡ تُخۡفُوهُ يُحَاسِبۡكُم بِهِ ٱللَّهُۖ ﴾، وە ئـەوەی كـە لـە

دەروونتاندا هەیە، ئەگەر ئاشکرای بکەن یاخود بیشارنەوە خوا لێپرسینەوەتان لەسەری لەگەڵدا دەکات، ئەگەر ئاشکرای بکەن ئەوە دیارە لەڕێی قسەوە، وە لەڕێی کردەوەوە ئاشکرا دەبێ، تۆ شتێکت لەدڵدایە، کەس نازانێ چیت لەدڵدایە، بەڵام کە قسەت کردو دەرتبڕی ئەوجار دەزانن چیت لە دڵدایە، وە ئەگەر کردەوەت پێکرد، دەزانن چیت لە دڵدایە، بەس دەگونجێ لە دڵی خۆتدا پەنهانی بکەی‌و نە بە زمان دەریبڕی، نە بە کردەوە پێشانی بدەی‌و بەرجەستە بکەی، بەڵام لە هەردوو حاڵەتدا خوا دەفەرموێ: لێپرسینەوەتان لەگەڵدا دەکەم، هەم لەسەر ئەوەی کە لەدڵتاندا پەنهانتان کردوەو، بێجگە لە خوا کەس پێی نازانێ، وە هەم لەسەر ئەوەش کە ئاشکراشتان کردوە، لەڕێی دەربڕینی زمان، یان لەڕێی جێبەجێکردنی ئەندامەکانەوە، دیارە دوایی دێینە سەر باسی ئەوە، کە چۆن خوا ﷻ شتێك کە بە دڵت دابێ لێپرسینەوەت لەگەڵدا دەکات‌و کامەی لێپرسینەوەی لەسەرەو کامەی لێپرسینەوەی لەسەر نیە ؟ وە چۆن هاوەڵانی بەڕێزی پێغەمبەر ﷺ لێیان ئیشکال بووو چوونە لای پێغەمبەر ﷺ و گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ! ئا ئەوەمان پێ جێبەجێ ناکرێ، هەر شتێکمان بەدڵدا هات خوا لێپرسینەوەمان لەگەڵدا بکات، چونکە ئینسان سەد فیکری بەدڵدا دێ، فیکری خراپ، نیەتی خراپ، جا ئەگەر خوای پەروەردگار لەسەر هەمووی لێمان بپرسێتەوەو سزامان بدات، دەرناچین ! کە دوای ئەم باسە ڕووندەکەینەوە، جا دەفەرموێ: ﴿ فَيَغْفِرُ لِمَن يَشَآءُ وَيُعَذِّبُ مَن يَشَآءُ ﴾، خوا لە هەرکەسێك دەبوورێ کە بیەوێ، وە هەرکەسێکیش ئازار دەدا کە بیەوێ ﴿ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴾، وە خوا لەسەر هەموو شتێك بە توانایەو هەموو شتێکی پێ دەکرێ.

ئنجا دێتە سەر خستنەڕووی هەڵوێستی پێغەمبەری خوا ﷺ و بڕوادارانی شوێنکەوتووی لە بەرانبەر پایە گەورەکانی ئیمانداو دەفەرموێ: ﴿ ءَامَنَ ٱلرَّسُولُ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيْهِ مِن رَّبِّهِۦ وَٱلْمُؤْمِنُونَ ﴾، پێغەمبەر ﷺ (کە موحەممەدە) بڕوای هێنا بەوەی کە بۆی نێرراوەتە خوار لە پەروەردگاریەوە، وە بڕوادارانیش بڕوایان هێنا

﴿ كُلٌّ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَمَلَٰٓئِكَتِهِۦ وَكُتُبِهِۦ وَرُسُلِهِۦ ﴾، هەر کامیان (لە پێغەمبەر ﷺ، وە تاك تاکی بڕواداران) بڕوایان هێنا بە خواو بە فریشتەکانی‌و بە کتێبەکانی‌و بە ڕەوانەکراوەکانی ﴿ لَا نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِّن رُّسُلِهِۦ ﴾، {وە گوتیان:} جیاوازی ناخەینە نێوان هیچ کام لە ڕەوانەکراوانی خوا، لە چ ڕوویەکەوە ؟! لەو ڕووەوە کە هەموویان نوێنەرو ڕەوانەکراوی خوان‌و هەڵگری پەیامی خوان‌و، هەموویان جێی ڕێزو حورمەتن‌و لەو ڕووەوە جیاوازیی ناخەینە نێوانیانەوە، بەڵام لەو ڕووەوە کە هەندێکیان لە هەندێکیان پلەیان بەرزترە، ئەوە دیارە خوا ﷻ بۆخۆی وایفەرمووە، وەك پێشتر باسمان کرد ﴿ وَقَالُواْ سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا غُفْرَانَكَ رَبَّنَا وَإِلَيْكَ ٱلْمَصِيرُ ﴾، وە گوتیان: بیستمان‌و فەرمانبەرییمان کرد، ئەی پەروەردگارمان ! وە سەرەنجامیش هەر بۆ لای تۆیە ! {واتە: ئەمە قسەی پێغەمبەرو ئیماندارانە}.

تەماشا بکەن ! عەقیدەکەیان لەسەر ئەو چوار پایە بنیاتنراوە: ئیمان بە خواو بە فریشتەکانی خواو بە کتێبەکانی خواو بە پێغەمبەرانی خوا (علیهم الصلاة والسلام)، لێرەدا باسی ڕۆژی دوایی نەکراوە، بەڵام لە کتێبەکانی خوادا باسی ڕۆژی دوایی هەیەو، کەسێك بڕوای بە کتێبەکانی خوابێ بڕوای بە ڕۆژی دواییش هەیە، وە پێغەمبەرانی خوا باسی ڕۆژی دواییان کردوە، وە خوا بۆخۆی باسی دیداری خۆی‌و باسی ڕۆژی دوایی‌و باسی فریشتەکانی کردوە، ئیمان‌و عەقیدەکەیان بەو شێوەیە، ئەدی قسەکەیان چییە؟ ﴿ وَقَالُواْ سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا ﴾: وە گوتیان: ئەوە بیستمان، وە فەرمانبەرییمان کرد، واتە: پەروەردگارمان ! کەلامی تۆو پەیامی تۆمان بیست، بەرنامەکەی تۆمان بیست‌و لێی حاڵی بووین ﴿ وَأَطَعْنَا ﴾، وە فەرمانبەریشین واتە: بە قسەت دەکەین‌و پابەندین، کەواتە: مسوڵمان ئەوە قسەیەتی: ﴿ سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا ﴾، لە بەرانبەر خواو لە بەرانبەر پێغەمبەری خوادا ﷺ دەبێ بڵێ: خوایە ! ئەوە بیستم‌و تێگەیشتم‌و قەبووڵم کرد ﴿ وَأَطَعْنَا ﴾، وە ئەوە جێبەجێشی دەکەم‌و پابەندیش دەبم بەوەوە کە تۆ ناردووتەو فەرمووتە،

﴿ غُفْرَانَكَ رَبَّنَا وَإِلَيْكَ ٱلْمَصِيرُ ﴾، داوای لێبوردنت لێ دەکەین، پەروەردگارمان ! ئەگەر کەم‌و کوورپیمان هەبوو لە جێبەجێ کردنیدا دەبێ لێمان ببووری‌و بمانپۆشی، وە بۆ لای تۆش دەگەڕێینەوەو سەرەنجاممان بۆ لای تۆیە، ئنجا خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا ﴾، خوا لە هیچ کەسێك داوا ناکات، مەگەر ئەوەی پێی دەکرێ، هەرشتێکت لە تواناد‌ا نەبێ خوا لەسەری پێویست نەکردووی، خوا هیچ لەسەر ئینسان پێویست ناکات، مەگەر ئەوەی کە لە تواناو وزەیدا هەبێ‌و بۆی جێبەجێ بکرێ، جا ئەوە وەك دوایی باسی دەکەین زۆر شتی لێوەردەگیرێ ﴿ لَهَا مَا كَسَبَتْ وَعَلَيْهَا مَا ٱكْتَسَبَتْ ﴾، هەرکەسێك‌و هەر نەفسێك ئەو کردەوە باشانەی دەیانکات قازانجی بۆخۆیەتی‌و، خوا ﷻ لەوە دەوڵەمەندترو بەرزو مەزنترە، ئێمە بتوانین بە کردەوە باشەکانمان سوودی پێ بگەیەنین، یان بە کردەوە خراپەکانمان زیانی پێ بگەیەنین، ئەوەی کە بەهرەمەند دەبێ لە کردەوەی باش هەر خۆمانین‌و، ئەوەش کە زەرەرمەند دەبێ لە کردەوەی خراپ هەر خۆمانین، وە خوا ﷻ نە بە طاعەتی ئێمە سوودو قازانجێك دەکات‌و نە لە خراپەو تاوانی ئێمەش زیان‌و زەرەرێکی پێدەگات.

ئنجا ئایا ئەو ئیماندارانە لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ دەپاڕێنەوەو ئەو دووعایە وێڕای ئیمانداران هی ئەویشە، یان هەر هی ئیماندارانە ؟ هەردووکیان دەگونجێن، ﴿ رَبَّنَا لَا تُؤَاخِذْنَآ إِن نَّسِينَآ أَوْ أَخْطَأْنَا ﴾، پەروەردگارمان، لێمانمەگرە ئەگەر لەبیرمان چوو یان هەڵەمان کرد، ئەگەر شتێکمان لەبیرچوو لەو ئەرکانەی کە تۆ لەسەرت پێویست کردووین‌و ئەنجاممان نەدا، لێمانمەگرە، وە ئەگەر بە هەڵەش گوناهێکمان کردو بەهەڵەدا چووین، لێمانمەگرە. ﴿ رَبَّنَا وَلَا تَحْمِلْ عَلَيْنَآ إِصْرًا كَمَا حَمَلْتَهُۥ عَلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِنَا ﴾، پەروەردگارمان ! وە قورساییەك کە خستووتە سەرشانی ئۆممەتانی پێشوو، مەیخە سەرشانی ئێمە {ئەو شتانە کە لە ئەنجامی هەڵەو کەم‌وکووڕیی ئۆممەتانی پێشوودا، خوای پەروەردگار جۆرێك لە سزای بۆ داناون، یان ئەرکی لەسەری قورس کردوون} ئەو قورسکردنانە لەسەرشانی ئێمە

دامەنێ ﴿ رَبَّنَا وَلَا تُحَمِّلْنَا مَا لَا طَاقَةَ لَنَا بِهِۦ ﴾، وە پەروەردگارمان! ئەرکێکمان مەخە سەرشان کە وزەمان بەسەریدا نەشکێو لە توانامانـدا نەبێ ﴿ وَٱعْفُ عَنَّا ﴾، وە لێمان ببوورە ﴿ وَٱغْفِرْ لَنَا ﴾، وە بمانپۆشەو چاوپۆشییمان لێبکە، ﴿ وَٱرْحَمْنَآ ﴾، وە بەزەییت پێمانـدا بێتەوە ﴿ أَنتَ مَوْلَىٰنَا ﴾، تۆ سەرپەرشـتیارو پشـتیوان‌و مشوورخۆری ئێمەی ﴿ فَٱنصُرْنَا عَلَى ٱلْقَوْمِ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴾، جا بەسەر کۆمەڵی بێبڕوایاندا سەرمان بخە، خواش ﷻ لە وەڵامی هەموو ئەو دووعایانەدا فەرموویەتی: بەڵێ، بەڵێ، ئەوەی گوتووتانە: قەبووڵە لەلای من‌و جێبەجێ دەبێ.

ئەوە کورتەیەك بوو لە مانای گشتی‌و تەفسیرو لێکدانەوەی ئەم سێ ئایەتە خوا ﷻ بە لوتف‌و کەرەمی خۆی ئێمە لەو کەسانە بگێڕێت، کە بە شێوەیەکی ڕاستەقینە ئیمان بە خوای بەرزو مەزن بە پێغەمبەری خوا ﷺ وە بە هەرچی کە پێغەمبەری خوا لە خواوە هێناویەتی، دێنن، وە پێشییەوە پابەند دەبن.

## چەند مەسەلەیەکی گرنگ

**مەسەلەی یەکەم:** خوا ﷻ کە دەفەرموێ: ﴿ لِّلَّهِ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ ﴾، هەرچی لە ئاسمانەکان‌و هەرچی لە زەویدایە هی خوایە، واتە: خاوەنی ئاسمانەکان‌و زەوی‌و هەرچی تێیاندایە بەس خوایە، لێرەدا پرسیارێك دروست دەبێت، یەکێك دەڵێت: ئەو زەوییە هی منە، ئەوە خانووە هی منە، ئەو پارەیە هی منە، ئەو سەیارەیە هی منە ... هتد، ئەوە یانی چی؟ لێرەدا خوا ﷻ کە دەفەرموێ: خوا خاوەنە بۆ هەرچی لە ئاسمانەکان‌و لە زەویدایە، مەبەست ئەوەنیە کە هیچ کەس خاوەنی هیچ شتێك نیە، چونکە خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ وَإِن تُبْتُمْ فَلَكُمْ رُءُوسُ أَمْوَٰلِكُمْ ...(٢٧٩) ﴾البقرة، واتە: ئەگەر تۆبەتان کردو گەڕانەوە، دەستمایەکانی خۆتان، سەرمایەکانتان بۆخۆتان، بەڵام مەبەست ئەوەیە کە خاوەنی ڕاستەقینە، خاوەنێك کە هەمیشە هەر

خاوەندارەو لە خاوەندارێتی ناکەوێ، تەنیا خوایەو، ئەوی دیکە ماوەی چەند ساڵێك خاوەنی ئەو شتەیە، یان لە ماوەی تەمەنیدا خاوەنیەتی، بەڵام دوایی خاوەنی نامێنێ‌و لە دوای خۆی دەچێ بۆ میراتگرەکان، یان دەچێ بۆ خەڵکی دیکە، یاخود هەر لە حاڵی ژیانی خۆیدا لەبەردەستی دێتە دەرێ!

**مەسەلەی دووەم:** کە دەفەرموێ: ﴿وَإِن تُبْدُواْ مَا فِيٓ أَنفُسِكُمْ أَوْ تُخْفُوهُ يُحَاسِبْكُم بِهِ ٱللَّهُ﴾، ئەوەی کە لە دڵتاندا هەیەو لە دەروونتاندا هەیە، ئەگەر ئاشکرای بکەن، یاخود پەنهانی بکەن، خوا لێپرسینەوەتان لەگەڵدا دەکات لەسەری، دیارە مەبەست لە ﴿مَا فِيٓ أَنفُسِكُمْ﴾، ئەو نیازو مەبەستانەن کە لە دڵ‌و دەروونـدا پەنهان دەکرێن، چونکە ئەوەی کە لە دەروونـدایە (ما في النّفس) ئەوەیە کە خەڵك پێی نازانێ، بۆیەش خوا دەفەرموێ: ئەگەر دەریبخەن یان پەنهانی بکەن، ئەگەرنا ئەگەر هی نێو دڵ‌و دەروون نەبێ، پەنهان ناکرێ‌و هەمیشە هەر ئاشکرا دەبێ، وە بۆیەش دەفەرموێ: ئەگەر دەریبخەن، چونکە دەتوانی دەرینەخەی، دەتوانی قسەنەکەی‌و کردەوەی پێ نەکەی، بەڵام لە هەردوو حاڵاندا، چ دەریبخەن وەك قسەو تەعبیر دەریببڕن‌و، چ وەك هەڵسوکەوت‌و ڕەفتار بەرجەستەی بکەن، وە چ بە پەنهانیی بمێنێتەوە، لە هەردوو حاڵاندا خوا لەسەری لێپرسینەوەتان لەگەڵدا دەکات، بەڵام بێگومان لێرەدا هەرنیازو خولیایەك کە بە دڵ دادێ، مەبەست نیە، بەڵکو مەبەست تەنیا ئەوە نیازو مەبەستانەن کە ئینسان دڵی خۆیان لەسەر دەچەسپێنێ‌و بڕیاریان لەسەر دەدا، کەواتە: ئەوەی کە ئینسان بەزەینیدا ڕەت دەبێ وەك خەتەرە (خاطر)ێك بە دڵی دێ، بەڵام دڵی لەسەر ناچەسپێنێ‌و جاری وا هەیە زۆریشی پێ ناخۆشە، کە هاوەڵانی بەڕێزی پێغەمبەر ﷺیش خوا لێیان ڕازی بێ، لەو جۆرە سەلامەت نەبوون، وەك لە (صحیح)ی موسلیم دا هاتوە: {عن أبي هريرة رضي الله عنه قال: جاء ناسٌ من أصحاب النبيِّ ﷺ فسألوه: إنّا نَجِدُ في أنفسنا ما يتعاظَمُ أَحَدُنا أن يتكلَّم بهِ، قال: (وقد وجدتموه) قالوا: نعم،

قال: (ذلك صريح الإِيمانِ): ٢٠٩ (١٣٢)}، واتە: کۆمەڵێك لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ هاتن پرسیاریان لێکرد: ئێمە شتی وا لە دڵی خۆماندا دەبینین: (واتە: وەك خولیاو خەیاڵ)، کە یەکێکمان زات ناکات باسی بکات، فەرمووی: ئەوەتان هەست پێکردوە ؟ گوتیان: بەڵێ، فەرمووی: ئەوە ئیمانی ڕووتە. واتە: ئەوە هیچ نیەو ئەوە نیشانەی ئیمانەو نیشانەی گومان نیە، هەروەها لە فەرموودەیەکی دیکەدا هاتوە: {عن عبدالله ﷺ، قال: سُئِلَ النبيّ ﷺ عن الوسوسة، قال: (تلك محصن الإيمان) مسلم: ٢١١ (١٣٣)}، واتە: پێغەمبەر ﷺ لەبارەی وەسوەسەوە پرسیاری لێکرا، فەرمووی: ئەوە ئیمانی تەواوە، واتە: شەیتان کە ناتوانێ تۆ لە چاکەو کردەوە باشەکان بگێڕێتەوەو دەیەوێ خوتخوتەو خەیاڵی خراپت بخاتە دڵ، وە نیشانەی تێرو تەواویی ئیمانیشە، وە ئا ئەوە کە ئینسان پێی ناخۆشەو بەدڵی دادێ، یاخود بە خێرایی بە دڵو زەینت دادێ بێ ئەوەی کە دڵت لەسەری بچەسپێنیو دوایی لێی پەشێمان دەبیەوە، ئەوە هیچی لێپرسینەوەی لەسەر نیە، وەك دوایی باسی دەکەینو ئەم فەرموودانەی پێغەمبەریش ﷺ بەڵگەی ڕوونن لەوبارەوە، یەکێ لە فەرموودەکان ئەوەیە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {(إِنَّ اللهَ تَجَاوَزَ لأُمَّتِي عَمَّا حَدَّثَتْ بِهِ أَنْفُسَهَا، مَا لَمْ تَكَلَّمْ، أَو تعْمَلْ بِهِ) (رَوَاهُ البُخَارِيُّ برقم: (٢٥٢٨)، وَمسلم برقم: (٣٢٧)، وَالنَّسَائِيُّ برقم: (٣٤٣٥)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٢٢٠٩)، والتِّرمِذِيُّ برقم: (١١٨٣)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٢٠٤٠)، عَنْ أَبي هُرَيرَةَ ﷺ، وَصَحَّحَهُ الألباني في (صحيح الجامع) برقم: (٤٤٥٠)}، واتە: بێگومان خوا چاوپۆشیی لە ئوممەتی من کردوە، لەوەی کە بەدڵیدا دێت، مادام قسەی پێ نەکردبێ، وە کردەوەی پێ نەکردبێ. ئەوەی کە بەدڵیدا دێ، واتە: بەدڵی دادێو پێی ناخۆشە[1]، یان بە دڵی داهاتوە لە کاتی هەڵچوونێکدا شتێکی

---

١) وەك ئەوەی لەم فەرموودەیەدا هاتوە:

{(يأتي الشيطان أحدكم فيقول: مَنْ خلق كذا وكذا ؟ حتى يقولَ لَهُ: مَن خَلَقَ ربَّك ؟ فإذا بلغ ذلك فَلْيَستَعِذْ بالله ولْيَنْتَهِ) البخاري: (٣٢٧٦)، ومسلم: (٢١٤)}، واتە: شەیتان دێتە

بەدڵدا هاتوە، بەڵام دوایی نیەتی خۆی لەسەر ساغ نەکردۆتەوەو نەیکردوە بە بڕیار، ئەگەرنا ئەگەر کردی بە بڕیار لێپرسینەوەی لەسەرە، وەك دوایی زیاتر ڕوونی دەکەینەوە.

فەرموودەیەکی دیکە لەوبارەوە: {(قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: قَالَ اللهُ ﷻ: إِذَا هَمَّ عَبْدِي بِسَيِّئَةٍ فَلاَ تَكْتُبُوهَا عَلَيْهِ، فَإِنْ عَمِلَهَا فَاكْتُبُوهَا سَيِّئَةً، وَإِذَا هَمَّ بِحَسَنَةٍ فَلَمْ يَعْمَلْهَا فَاكْتُبُوهَا حَسَنَةً، فَإِنْ عَمِلَهَا فَاكْتُبُوهَا عَشْرًا) (رَوَاهُ مسلم برقم: (٣٣٠)، عَنْ أَبِي هُرَيرَةَ رضي الله عنه}، واتە:پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خوای بەرزو مەزن فەرموویەتی: هەرکات بەندەی من بە دڵی داهات خراپەیەك بکات لەسەری مەنووسن، { هەر لەبەرئەوەی کە بە دڵی داهاتوە}، جا ئەگەر کردی، خراپەیەکی بۆ بنووسن، وە هەرکاتێك چاکەیەکی بەدڵدا هات و ئەنجامی نەدا، چاکەیەکی بۆ بنووسن، وە ئەگەر ئەنجامیدا، دە چاکەی بۆ بنووسن.

لێرەدا مەبەست لە خراپە بەدڵ داهاتن، ئەوەیە کە ئینسان بڕیاری لەسەر نەدابێ و دڵی لەسەر نەچەسپاندبێ، ئەوەی هەروا بە دڵی دادێت و دوایی لێی پەشیمان دەبێتەوە، بەڵام ئەگەر دڵی لەسەر چەسپاند، با بە کردەوەش ئەنجامی نەدا، یاخود بە قسەش دەرینەبڕێ، هەر لەسەری دەنووسرێ، چونکە دڵی خۆی لەسەر ساغ کردۆتەوە، وە لەڕاستیدا بناغەی چاکەو خراپە لە دڵدایەو، بڕیاری نێو دڵەو، هەرکەسێ کە دەیەوێ چاکەیەك بکات، پێشێ بە دڵ بڕیاری لەسەر دەدات، وە ئەگەر بیەوێ خراپەیەك بکات پێشێ بە دڵ بڕیاری لەسەر دەدات، بەڵام خوای پەروەردگار ڕەحمەتی پێش غەزەبی کەوتوەو بەخششی فراوانە، بۆیە کەسێك چاکەیەکی هەر بەدڵیش دابێ، خوا دەفەرموێ: چاکەی بۆ بنووسن، وە ئەگەر ئەنجامیشیدا دە چاکەی بۆ بنووسن و هەتا یەك بە حەوت سەدیش دەڕوا.

---

لای یەکێکتان (بە وەسوەسە) پێی دەڵێ: کێ ئەو شتەو ئەو شتەی دروستکردوە ؟ هەتا پێی دەڵێ: کێ پەروەردگارتی دروستکردوە ؟ جا ئەگەر گەیشتە ئەوە با پەنا بەرێتە بەر خواو وازبێنێ.

**مەسەلەی سێیەم:** کە دەفەرمویٚ: ﴿ فَيَغۡفِرُ لِمَن يَشَآءُ وَيُعَذِّبُ مَن يَشَآءُ ﴾، لە هەر کەسێك بیەوێ دەبووریٚ، وە هەرکەسێکیش ئازار دەدا کە بیەوێ، جا ئایا خوا لە کێ دەبووریٚو لە کێ نابووریٚ ؟ لەڕاستیدا خوای دادگەر لەو کەسانە دەبووریٚ کە شتەکەیان هەروا بەدڵدا هاتوە، بێ ئەوەی بیکەنە بڕیار، لەوانە دەبووریٚ، ئەدی لە کێ نابووریٚو سزای دەدا ؟ ئەو کەسەی کە دڵی لەسەر کردنی خراپەیەك ساغ کردۆتەوە، بەڵام هەلومەرجی بۆ نەڕەخساوە، کە گوناهەکە بکا، بۆ وێنە: کەسێك دڵی خۆی ساغ کردۆتەوەو بڕیاری تەواوی داوە نەفەرێك بکوژێ، بەڵام دوایی بەرپەلی ناکەوێ، یاخود دەستەڵاتی بەسەریدا ناشکێ، هەرچەندە بڕیاری تەواوی لێداوە، کە ئەگەر لێی هەڵکەوێ دەیکوژێ، ئەوە بەدڵنیایی یەوە بۆی دەنووسرێ، هەروەك ئەگەر دڵی خۆی لەسەر چاکەیەك ساغ بکاتەوە، خوای پەروەردگار بە ئەندازەی ئەوەی کە عەزمی لەسەر جەزم کردوە، بۆی دەنووسێ، وە ئەگەر هەر بەدڵیشی دابێ، بە مەرجێك دوایی لێی پەشیمان نەبێتەوە، ئەوە خوای بەخشندە لە بەخششی خۆی هەر بۆی دەنووسێ.

**مەسەلەی چوارەم:** هەندێك لە زانایانو توێژەران دەربارەی ئەم ڕستە قورئانییە کە دەفەرمویٚ: ﴿ وَإِن تُبۡدُواْ مَا فِيٓ أَنفُسِكُمۡ أَوۡ تُخۡفُوهُ يُحَاسِبۡكُم بِهِ ٱللَّهُۖ ﴾، گوتوویانە: ئەم ڕستەیە کە لە ئایەتی ژمارە (٢٨٤)دا هاتوە، بەو فەرمایشتەی خوا کە لە ئایەتی (٢٨٦)دا هاتوە، نەسخ بۆتەوە کە دەفەرمویٚ: ﴿ لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفۡسًا إِلَّا وُسۡعَهَا ﴾، خوا لە هیچ کەسێك داوا ناکات، مەگەر ئەوە کە لە توانایدا هەبێ، دەڵێن: ئەوەش لەتوانای ئینساندا نیە، کە نەهێڵێ خەتەرەی خراپ بە دڵدابێ، لەبەر ئەوە ئایەتی دوایی ئەوەی پێشتری نەسخ کردۆتەوە، بەڵام لەڕاستیدا وانیە، جا ئەگەر یەکێ بڵێ بۆچی؟ لە وەڵامدا دەڵێین :

١/ ئەوە کە خوا ﷻ دەفەرمویٚ: ﴿ لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفۡسًا إِلَّا وُسۡعَهَا ﴾، واتە: خوا لە هیچ کەسێك داوا ناکات، ئەوە نەبێ کە لە توانایدایە، لەگەڵ ئەو ڕستە

قورئانییەی دیکە کە دەفەرموێ: ﴿ وَإِن تُبْدُواْ مَا فِىٓ أَنفُسِكُمْ أَوْ تُخْفُوهُ يُحَاسِبْكُم بِهِ ٱللَّهُ ﴾، واتە: خوا لێپرسینەوەتان لەگەڵدا دەکات لەسەر ئەوەی کە لە دڵتاندا هەیە، چ پەنهانی بکەن چ ئاشکرای بکەن، تێك ناگیرێن، بە مەرجێك هەردووکیان وەك خۆیان لێیان تێبگەین، چونکە ئەوە کە دەفەرموێ: خوا لێپرسینەوەتان لەگەڵ دەکات لەسەر ئەوەی کە لە دڵتاندا هەیە، مەبەست ئەوەنیە کە بە دڵت دادێ و دەڕوات، بەڵکو ئەوەیە کە دڵی خۆتی لەسەر ساغ دەکەیەوەو، عەزمی لەسەر جەزم دەکەی و عەزمت لەسەر هەر گوناهێك جەزم کرد، خوا لێپرسینەوەت لەگەڵدا دەکات، وە ئەوەش شتێك نیە کە لە تواناڈا نەبێ، واتە: ئەوەی لە ئایەتی پێشێدا هاتوە، لەگەڵ ئەوەی کە دەفەرموێ: ﴿ لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا ﴾، تێك ناگیرێ، چونکە ئینسان دەتوانێ دڵی خۆی لەسەر گوناهو خراپە ساغ نەکاتەوەو عەزم جەزم نەکات، بەڵام ناتوانێ ئەو گوناهە بە دڵیدا نەیەت و بە زەینیدا ڕەت نەبێ، ناتوانێ خۆی وا لێبکا هیچ گوناهێك بەدڵیدا نەیەت، بەڵام دەتوانێ دڵی خۆی لەسەر گوناح ساغ نەکاتەوەو بڕیاری لەسەر نەدات، کەواتە: ﴿ لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا ﴾، خوا لە هیچ کەسێك داوا ناکات ئەوە نەبێ کە لە توانایدا هەیە، ئەوەیە کە بڕیار نەدات لە دڵی خۆیدا لەسەر گوناح، بەڵام ئەوەی لە توانایدا نیە ئەوەیە کە شتێك بەدڵیدا دێ، زوو تێپەڕ وەك خەیاڵ (خاطر)ێك بە دڵیدا دێ، ئەوە لە توانای ئینساندا نیە، کە ڕێی لێبگرێ، لەبەر ئەوە خوای بە بەزەیی لەسەر ئەوە لێی ناپرسێتەوە، کەواتە: ئەو دوو ئایەتە، یان ئەو دوو ڕستە قورئانییە تێك ناگیرێن، تاکو بڵێین: ئەوەی دووەمیان ئەوەی یەکەمیانی (نَسْخ) کردۆتەوە، ئەوە بەڵگەی یەکەم.

٢/ بەڵگەیەکی دیکەش ئەوەیە کە خوا دەفەرموێ: ﴿ وَإِن تُبْدُواْ مَا فِىٓ أَنفُسِكُمْ أَوْ تُخْفُوهُ يُحَاسِبْكُم بِهِ ٱللَّهُ ﴾، ئەواتە: ئەوەی کە لە دڵتاندا

هەیە دەریخەن یاخود پەنهانی بکەن، خوا لێپرسینەوەتان لەگەڵدا دەکات، ئەوە هەواڵ (خَبَر)ە، زانایانو توێژەرەوانی قورئانیش دەڵێن: (نَاسخ)و (مَنْسُوخ) تەنیا لە یاسایان (أَحكام)دا هەیەو، لە هەواڵان (أَخبار)دا نیە، ئنجا ئاشکرایە کە مەسەلەی لێپرسینەوە کردنی خوا لەگەڵ بەندەکانیدا لەسەر ئەو شتانەی بە دڵیان دا دێنو دەچنو، هەواڵدانی خوا لەوبارەوە لە خانەی هەواڵان (أَخبار) دایە، نەك یاسایان (أَحكام)، بۆیە نەسخ نایگرێتەوە، ئەگەر گریمان هەشبێ !

٣/ ئنجا خوا ﷻ بۆ ئێمەی ڕوونکردۆتەوە، کە ئەوەی کە بە دڵ وەدەستدەهێنرێ لە چاکەو لە خراپە، لێپرسینەوەی لەسەرەو سزاو پاداشتی لەسەرە، کەواتە: ناگونجێ بگوترێ ئایەتی ژمارە (٢٨٤) کە باسی لێپرسینەوەی کردەوەکانی دڵ (أعمال القلب) دەکات (مَنْسوخ)ە ! ئەوەتا خوای دادگەر دەفەرموێ: ﴿ لَّا يُؤَاخِذُكُمُ ٱللَّهُ بِٱللَّغْوِ فِىٓ أَيْمَـٰنِكُمْ وَلَـٰكِن يُؤَاخِذُكُم بِمَا كَسَبَتْ قُلُوبُكُمْ ۗ وَٱللَّهُ غَفُورٌ حَلِيمٌ ﴿٢٢٥﴾ ﴾ البقرة، واتە: خوا بە سوێندی سەرزارەکیی سزاتان نادات‌و لێتان ناگرێ، بەڵام سزاتان دەدا بە شتێك کە دڵتان وەدەستی دێنێ، کەواتە: ئێمە بە کردەوەی دڵ (عمل القلب) لێپرسینەوەمان لەگەڵ دەکرێ، وە سزاو پاداشتمان دەدرێتەوە، مادام وابێ تێکگیران لە نێوان ئەو دوو ڕستە بەبڕستە قورئانیەدا نیە تاکو ناچاربین بڵێین: هی دووەمیان یەکەمیانی نەسخ کردۆتەوە.

وە هەر لەوبارەیەوە خوا لە سووڕەتی (المائدة)دا دەفەرموێ: ﴿ لَا يُؤَاخِذُكُمُ ٱللَّهُ بِٱللَّغْوِ فِىٓ أَيْمَـٰنِكُمْ وَلَـٰكِن يُؤَاخِذُكُم بِمَا عَقَّدتُّمُ ٱلْأَيْمَـٰنَ فَكَفَّـٰرَتُهُۥٓ ...﴿٨٩﴾ ﴾، واتە: خوا بە سوێندی سەرزارەکیی لێتان ناگرێ، بەڵام بەوەی کە گرێتان لەسەر داوەو دڵتان لەسەری چەسپاندوە، لەسەر ئەوە لێتان دەگرێ، وە ئەگەر سوێندەکەتان شکاندبێ کەفارەت بدەن.

وە پاشان خوا ﷻ لە سووڕەتی (الأنعام)دا دەفەرموێ: ﴿ وَذَرُوا۟ ظَـٰهِرَ ٱلْإِثْمِ وَبَاطِنَهُۥٓ ...﴿١٢٠﴾ ﴾، واتە: دەستهەڵگرن لە گوناهی ئاشکراو لە گوناهی پەنهان،

گوناهی ئاشکرا ئەوە دیارە: قەتڵە، زینـایە، دزییـە، غەیبەتـە، دوو زمـانیی یـە، درۆیە، خۆهەڵکێشانە بەسەر خەڵکدا، بەکەم تەماشاکردنی خەڵکە، ئەو شتانەی کە بە زمانو ئەندامەکان دەکرێن ئەوە گوناهی ئاشکرایە، ئەدی گوناهی پەنهان چییە ؟ ئەو شتانەن کە لە دڵدان، وە نیەتی خۆچەسپاندنە لەسەر گوناح: وەك ئێرەیـی (حَسَد)، بوغزوکینـە، خۆبەزلگـریی، خۆپەسـندیی، نیفـاق...هتـد، پێشـتریش گوتمـان وەسوەسـەو خـەیاڵی زوو تێپـەڕ، جیایـە لـە عـەزمو نیـەتی چەسپاو، عەزمو نیەتی چەسپاو، چ لەسـەر چاکە بـێ، چ لەسـەر خراپـە، سزاو پاداشتی هەیە، بەڵام وەسوەسەو خەیاڵی زوو تێپەڕ لێپرسینەوەی لەسەر نیە.

٤/ ئنجا ڕێگرتن لە وەسوەسـەو خەیـاڵ لە توانـای مرۆڤـ بـەدەرەو ناتوانـێ ڕێیـان لێبگـرێ، بـە بەڵگـەی ئـەوە کـە وەك ئـەمری واقیـع دیـارە، وە خـواش ﷻ دەفـــــەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوۡاْ إِذَا مَسَّهُمۡ طَٰٓئِفٞ مِّنَ ٱلشَّيۡطَٰنِ تَذَكَّرُواْ فَإِذَا هُم مُّبۡصِرُونَ ﴿٢٠١﴾ ﴾الأعراف، واتـە بێگـومان ئەوانـەی خۆپـارێزن {ئەهلـی تەقـوان} کاتێـك کـە شـەیتان بـەلایان داهـات {خوتخوتـەی شـەیتان هاتـە نێـو دڵیـان} خوایان بەبیـردێتەوەو یەکسـەر دەبینن، وە خوای پەروەردگـار ئێمـەی فێرکـردوە کـە لـە وەسوەسـەو دنـەدانی شـەیتان پـەنا بـەخوا بگـرین، وەك فەرموویەتی: ﴿ قُلۡ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلنَّاسِ ﴿١﴾ مَلِكِ ٱلنَّاسِ ﴿٢﴾ إِلَٰهِ ٱلنَّاسِ ﴿٣﴾ مِن شَرِّ ٱلۡوَسۡوَاسِ ٱلۡخَنَّاسِ ﴿٤﴾ ٱلَّذِي يُوَسۡوِسُ فِي صُدُورِ ٱلنَّاسِ ﴿٥﴾ مِنَ ٱلۡجِنَّةِ وَٱلنَّاسِ ﴿٦﴾ ﴾ الناس، واتـە: {(بڵـێ پـەنا دەگـرم بـە پـەروەردگاری خەڵکی ﴿١﴾ بە پادشـای خـەڵکی ﴿٢﴾ بە پەرسـتراوی خـەڵکی ﴿٣﴾ لـە خراپـەو زیانی خوتخوتەکەری خۆ پەنهانکەر {(الوسـواس): سیفەتی شـەیتانە، واتـە: وەسوەسـەکەر (المُوسـوس) ئەو کەسەی کە خوتخوتە دەکاتو دنـەدەدا بـەرەو خراپـە، (الخنـاس) واتە: زۆر خۆ پەنهانکـەر (صیغة المبالغة)ی (خـانِس)ە، واتە: ئەوەی خـۆی پـەنهان دەکـاتو سـەر دەردێنـێ، ئەگـەر یـادی خـوات کـرد، سـەر دەباتەوە ژووری} ﴿٤﴾ ئەوەی کە وەسوەسـە دەخاتە نێو سینەی خەڵکەوە

(٥) كە لە جندو لە مرۆڤیشە (٦)).

٥- ئنجا ئەدی ئەوەی كە لەو فەرمایشتەدا هاتوە، كە لە هۆی هاتنە خوارەوەدا باسمان كرد كە دەڵێ (فَلَمَّا اقْتَرَأَهَا القَوْمُ، ذَلَّتْ بِها أَلْسِنَتُهُمْ فَأَنْزَلَ اللهُ في أَثَرِها: ﴿ ءَامَنَ ٱلرَّسُولُ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيۡهِ مِن رَّبِّهِۦ وَٱلۡمُؤۡمِنُونَ ... ﴾، فَلَمَّا فَعَلُوا ذَلِكَ نَسَخَهَا اللهُ تَعَالى)، ئایا مەبەست پێی چییە؟ دەڵێین: مەبەست ئەوەیە كە خوای بە بەزەیی بە ئایەتی دواتر، چەمكو واتای ئایەتی پێشتری ڕوونكردۆتەوە، چونكە وەك كاتی خۆی لە دەمی توێژینەوەی ئایەتی ﴿ مَا نَنسَخۡ مِنۡ ءَايَةٍ أَوۡ نُنسِهَا نَأۡتِ بِخَيۡرٖ مِّنۡهَآ أَوۡ مِثۡلِهَآۗ ...(١٠٦) ﴾البقرة، هەندێ جار زانایانی پێشین وشەی (نَسْخ)یان بەكارهێناوە، بۆ شتێك كە بە كورتیی باسكراوەو دوایی خوای زانا ڕوونی كردۆتەوە، لێرەشدا خوای بەرز بە ئایەتی دواتر كە دەفەرموێ: ﴿ لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفۡسًا إِلَّا وُسۡعَهَا ﴾، چەمكو واتای ئایەتەكەی پێشێ ڕووندەكاتەوە، چونكە هاوەڵەكان خوا لێیان ڕازی بێ، كە چوونە خزمەت پێغەمبەر ﷺ، وایانزانیوە هەر خەتەرەی خراپیان بە دڵ دابێ، خوا سزایان دەدات، بەڵام ئایەتەكەی دیكە ڕوونی كردەوە، كە ئێوە باشی لێ حاڵی نەبوونو، ئەوەی زوو تێپەڕەو لە تواناتاندا نیە ڕێی لێبگرن، خوا لێتان داوا ناكات، ئەدی خوای پەروەردگار چ لە ئێمە داوا دەكات؟! شتێك كە لە توانامانداهەیە، ئێمە دەتوانین دڵی خۆمان لەسەر خراپە نەچەسپێنینو بڕیاری لەسەر نەدەین، بەڵام لە تواناماندا نیە ڕێگا بگرینو نەهێڵین هیچ خەتەرەو خەیاڵێكی خراپ بەسەر دڵماندا بێ، لەبەر ئەوە خوای دادگەر لەسەر ئەوە سزامان نادات، وە ئەوەش شتێك نیە لەسەرمان پێویست كرابێ، كەواتە: كە لە فەرمایشتەكەدا هاتوە دەڵێت: (نَسَخَهَا اللهُ تَعَالى) واتە: خوای بەرز بۆی ڕوونكردنەوەو ئەو چەمكو واتا هەڵەیەی كە ئەوان لێیان وەرگرتبوو، خوا ئەو چەمكو واتا هەڵەیەی لە مێشكیاندا سڕیەوەو ڕوونیكردەوە: ئەو تێگەیشتنە هەڵەیەی كە ئێوە لێتان گرتوە، ئەوەیان مەبەست نیە.

**مەسەلەی پێنجەم:** كە دەفەرموێ: ﴿ ءَامَنَ ٱلرَّسُولُ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيۡهِ مِن رَّبِّهِۦ وَٱلۡمُؤۡمِنُونَۚ كُلٌّ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَمَلَٰٓئِكَتِهِۦ وَكُتُبِهِۦ وَرُسُلِهِۦ لَا نُفَرِّقُ بَيۡنَ أَحَدٖ مِّن رُّسُلِهِۦ ﴾، ئەم ڕستەیە دوو جۆرە واتای هەن: چونكە یەكێك لەو هۆیانەی كە ئینسان واتای قورئانی باش بۆ ڕوون دەبێتەوەو، زۆر جار چەند واتایەكی جیا جیای بۆ پەیدادەبن، مەسەلەی وەستان (وقف)ە، لە كوێ دەوەستی و چۆن ڕستەكانی قورئان بە یەكەوە دەبەستیەوە؟ جا ئەگەر لە كۆتایی ﴿ ءَامَنَ ٱلرَّسُولُ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيۡهِ مِن رَّبِّهِۦ ﴾دا بوەستین، ئەوە ئەم ئایەتە مانایەكەی ئەوەیە كە پێغەمبەر ﷺ بڕوای هێناوە بەوەی كە لە پەروەردگاری بۆی دابەزیوە، چونكە پێغەمبەر ﷺ دەبێ قەناعەتی بۆ دروست بووبێ، كە ئەو قورئانەی جیبریل پێی دەڵێ، فەرمایشتی خوایە، بەڵام ئەگەر لە كۆتایی ڕستەی پێشوودا نەوەستین و یەكسەر ئەمەش بخوێنین: ﴿ وَٱلۡمُؤۡمِنُونَۚ كُلٌّ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَمَلَٰٓئِكَتِهِۦ وَكُتُبِهِۦ وَرُسُلِهِۦ ﴾، وە بڕوادارانیش هەركامێكیان ئیمانیان هێنا بە خواو بە فریشتەكانی و بە كتێبەكانی و بە پێغەمبەرانی (علیهم الصلاة والسلام)، دیارە ئەوكاتە مانای ڕستەكە ئاوای لێدێ: بڕوادارانیش ئیمانیان هێنا بەوەی كە بۆ پێغەمبەر ﷺ هاتۆتە خوارەوە، وە هەر كام لە پێغەمبەری خواو لە تاك تاكی بڕواداران بڕوایان هێنا بە خواو بە فریشتەكانی و بە كتێبەكانی و بە پێغەمبەرانی (علیهم الصلاة والسلام).

**مەسەلەی شەشەم:** كە دەفەرموێ: ﴿ لَا نُفَرِّقُ بَيۡنَ أَحَدٖ مِّن رُّسُلِهِۦ ﴾، جیاوازیی ناخەینە نێوان هیچ كام لە ڕەوانەكراوانی، واتە: لەڕووی بڕوا پێبوونەوە، كەواتە: با هیچ كەس وانەزانێ ئەم ئایەتە لەگەڵ ئایەتێكی پێشتر، كە دەفەرموێ: ﴿ تِلۡكَ ٱلرُّسُلُ فَضَّلۡنَا بَعۡضَهُمۡ عَلَىٰ بَعۡضٖ... ﴿٢٥٣﴾ ﴾، واتە: ئەو پێغەمبەرانە هەندێكیانمان بەسەر هەندێكیاندا بەرز كردۆتەوە، تێكدەگیرێ، چونكە ئەوەی سادەبێ دەڵێ: لێرەدا دەفەرموێ: جیاوازییان ناخەینە نێوانو، لەوێش

دەفەرمویّ: هەندێکیانمان بەسەر هەندێکیاندا بەرزکردۆتەوە! واتە: هەندێکیان بەسەر هەندێکیاندا بەرز دەکەینەوە لەڕووی پلەو پایەوە، بەلاّم جیاوازییان ناخەینە نێوان، لە ڕووی ئەسڵی ئیمانو بڕوا پێ هێنانەوە، کە پێغەمبەری خوانو هەلگری پەیامی خوان، لەو ڕووەوە جیاوازیی ناخەینە نێوانیان.

**مەسەلەی حەوتەم:** کە دەفەرمویّ: ﴿ وَقَالُواْ سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا غُفْرَانَكَ رَبَّنَا وَإِلَيْكَ الْمَصِيرُ ﴾، ئەم ڕستە قورئانییە، بەرنامەی ئینسانی مسوڵمانەو هەڵوێستی مسوڵمان لە بەرانبەر دینی خوادای هەمووی تێدایە، سەرەتا مسوڵمان دەڵێ: ﴿ سَمِعْنَا ﴾، واتە: وەرمانگرت، ئیماندار بەرنامەو پەیڕەوی ژیانی لە خوای پەروەردگارییەوەو لە خاوەنییەوە وەریدەگری، لێرەدا ﴿ سَمِعْنَا ﴾، یانی: وەرمانگرتوەو لێی حاڵی بووین، ﴿ وَأَطَعْنَا ﴾، دوای ئەوەی کە زانیت ئەوە بەرنامەو شەریعەتی خوایە، هیچ ڕێیەکت لە پێشدا نیە مادام تۆ خۆت بە بەندەی خودا بزانی، مەگەر ئەوە کە بە قسەی پەروەردگاری خۆت بکەی‌و، بە بەرنامەکەیەوە پابەندبی، بۆیە: ﴿ وَأَطَعْنَا ﴾، یانی: پابەندو فەرمانبەرین، ئنجا چونکە جاری وا هەیە لە تێگەیشتنماندا بۆ بەرنامەی خوا، یان لە پابەندییماندا بە بەرنامەی خواوە، خەلەل‌و کەم‌وکووڕییمان دەبێت، بۆیە هەمیشە پێویستمان دەبێ داوای چاوپۆشیی‌و لێبوردن لە خوا بکەین، پاشان ئێمە هەرچی بیکەین هەر لە قەدەر خوا نیە ﷻ و هەرچی بکەین، پایەی خوای بەرز زۆر لەوە بەرزترە، شایستەی خوای پەروەردگار نیە، بەلاّم ئێمە هەر ئەوەندەمان لە توانادایە، بۆیە دەڵێین: ﴿ غُفْرَانَكَ ﴾، داوای لێبوردنت لێدەکەین، بۆیە پێغەمبەریش ﷺ لەدوای هەر نوێژێکی فەرز سێ جاران دەیفەرموو[1]:

---

١) صحيح مسلم: (٥٩١) {(عن ثوبانّ رضي الله عنه قال: كان رسول الله ﷺ إذا انصرف من صلاته أستغفر ثلاثاً، وقال: اللّهم أنت السلام و منك السلام، تباركت يا ذا الجلال والإكرام)، قيل للأوزاعي وهو أحد رواة الحديث: كيف الإستغفار؟ قال: تقول: أستغفرُ الله، أستغفرُ الله}.

(أَستَغْفِرُ الله، أَستَغْفِرُ الله، أَستَغْفِرُ الله){داوای لێبوردن لە خوا دەكەم، داوای لێبوردن لە خوا دەكەم، داوای لێبوردن لە خوا دەكەم} لەگەڵ سەلامی دەدایەوە یەكسەر سێ جار وایدەفەرموو، جا ئایا ئەمە: یانی چی ؟ یانی: ئینسان هەتا زیاتر خوا بناسێ، زیاتر خۆی بە كەمتەرخەم دەزانێ لە بەرانبەر خواداو هەتا كەمتر خوا بناسێ، زیاتر پێی وایە شتێكی زۆر گرنگی كردوە بۆ خوا، بۆیە پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) لە هەموو كەس زیاتر لە بەرانبەر خوادا خۆیان بە بچووك داناوەو گوتوویانە: خوایە گوناهمان كرد، هەڵەمان كرد، لێمان ببوورە، ئنجا ئایا گوناح و هەڵەكەشیان چی بووە؟ هەر ئەوە بووە كە لە بۆچوون (إجتهاد)ێكدا نەیانپێكاوە، ئەگەرنا موستەحیلە هیچ پێغەمبەرێك زانیبێتی ئەوە گوناهەو خوا پێی ناخۆشەو، كردبێتی، شتی وا نەبووە، ئەدی بۆچی ناویان لێناوە: (عصیان، ذنب، ظلم)؟! یانی: خوایە ! ئەوەی ئێمە دەیكەین، با نەپێكانیش بێ لە بۆچوونێكدا، یاخود هەڵبژاردنی یەكێك لە دوو شتان بێ، كە ئەوی دیكەیان باشتر بووبێ (ترك اختیار الأَوْلى)، كە ئەوە بۆخۆی بۆ ئێمە گوناح نیە، بەڵام پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) پایەیان هێندە بەرز بووە، وە خوای پەروەردگاریان هێندە لەلا بەرزو مەزن بووە، گوتوویانە: ئەو شتانەش شایستەی مەقامی بەرزی خوا نین، ئەگەرنا ئەو شتانەی ئەوان ناوی: (عصیان، ذنب، ظلم)یان بۆ بەكارهێنراون، سەرپێچیی و گوناهو ستەم نین، بەو چەمك و واتایەی كە ئێمە دەیزانین، بۆ وێنە: خوای پەروەردگار لە سوورەتی (الفتح)دا دەفەرموێ: ﴿إِنَّا فَتَحْنَا لَكَ فَتْحًا مُّبِينًا ۝١ لِّيَغْفِرَ لَكَ اللَّهُ مَا تَقَدَّمَ مِن ذَنبِكَ وَمَا تَأَخَّرَ ۝٢﴾، واتە: ئێمە فەتحێكی ڕوونمان بۆتۆ كرد، بۆ ئەوەی خوا لە گوناهی سەرەتاو دواییت خۆشبێ، لێرەدا گومانتان وانەچێ بڵێن: دەبێ پێغەمبەر ﷺ چەندی گوناح كردبن، خوای لێبوردە لە هەموویان خۆش بووبێ ؟! گوناهی پێغەمبەر ﷺ هەر ئەوەبووە، كە كۆشش (إجتهاد)ێكی كردوەو نەیپێكاوە، بۆ وێنە: سەرەتای سوورەتی (عبس) تەماشا بكەن:

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴿ عَبَسَ وَتَوَلَّىٰٓ ﴿١﴾ أَن جَآءَهُ ٱلْأَعْمَىٰ ﴿٢﴾ وَمَا يُدْرِيكَ لَعَلَّهُۥ يَزَّكَّىٰٓ ﴿٣﴾ أَوْ يَذَّكَّرُ فَتَنفَعَهُ ٱلذِّكْرَىٰٓ ﴿٤﴾ أَمَّا مَنِ ٱسْتَغْنَىٰ ﴿٥﴾ فَأَنتَ لَهُۥ تَصَدَّىٰ ﴿٦﴾ وَمَا عَلَيْكَ أَلَّا يَزَّكَّىٰ ﴿٧﴾ وَأَمَّا مَن جَآءَكَ يَسْعَىٰ ﴿٨﴾ وَهُوَ يَخْشَىٰ ﴿٩﴾ فَأَنتَ عَنْهُ تَلَهَّىٰ ﴿١٠﴾ كَلَّآ إِنَّهَا تَذْكِرَةٌ ﴿١١﴾ ﴾، ڕۆژێکیان پێغەمبەر ﷺ سەرگەرمی ئامۆژگارییکردن‌و دواندنی سەرانی قوڕەیش دەبێ لەو کاتەدا (إبن أُم مكتوم) (عەبدوڵڵای کوڕی مەکتووم) کە پیاوێکی کوێر بووە، دێ بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ، نازانێ کە سەرگەرمی دواندنی ئەو زلە زلانەیە، وە ئەوانەش عادەتیان وابووە کوێرو هەژارو نەدارو کۆیلەو ئەوانە نەهاتۆتە کوڕو مەجلیسیان‌و قەبووڵیان نەکردوە، دێ، دەڵێ: ئەی پێغەمبەری خوا ! خوا چ ئایەتێکی دیکەی بۆ ناروودیە خوارەوە فێرم بکەی، یان چ ئەرکێکی دیکە هاتۆتە خوارەوە پێم بڵێی، تاکو ئەنجامی بدەم ؟ {دیارە پێغەمبەر ﷺیش پێشێ پێی فەرمووە ئێستا مەجالم نیەو ئەویش لێی دووبارە کردۆتەوە، ڕەنگە ئاگای لێنەبووبێ}، جا خوا لەبارەی هەڵوێستی پێغەمبەرەوە فەرموویەتی: ﴿ عَبَسَ وَتَوَلَّىٰٓ ﴾، ڕووی خۆی گرژ کردو لاملی لێ سووڕاند ﴿ أَن جَآءَهُ ٱلْأَعْمَىٰ ﴾، کاتێ کوێرەکە هات بۆلای، ئیدی لەسەر ئەوەندە خوای دادگەر سەرزەنشتی پێغەمبەری کردوە، دوایی پێغەمبەری خوا ﷺ هەر جارێك دەگەیشە عەبدوڵڵای کوڕی مەکتووم دەیفەرموو: {(مَرْحَبًا بِمَن عَاتَبَنِي فِيهِ رَبِّي)}[1]، واتە: سڵاو لەو کەسەی لەسەر وی پەروەردگارم لۆمەی کردم ! ئاشکراشە کە ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەری لۆمەکراوە

---

١) {(أخرج الترمذي والحاكم عن عائشة رضي الله عنها قالت: أُنزل: (عَبَسَ وَتَوَلَّىٰٓ) في إبن أُم مكتوم الأعمى، أتى رسول الله ﷺ فجعل يقول: يا رسول الله ! أرشدني وعند رسول الله رجلٌ من عظماء المشركين، فجعل رسول الله ﷺ يُعْرِضُ عنه ويُقبِلُ على الآخر...) (لُباب النقول في اسباب النزول) للسيوطي: (١١٨٨)، وە (أسباب النزول) للواحدي، ص: (٤٧١).

هەر ئەوە بووە کە ڕووی لە عەبدوڵلا گرژ کردوە، کە بۆچی لەوکاتەدا کە سەرگەرمی قسەکردن بووە لەگەڵ ئەو نەفەرانەدا، پرسیاری لێکردوە ! کە دیارە ئیجتیهادی پێغەمبەر ﷺ وابووە، لەوکاتەدا وەڵامی نەداتەوەو پشتگوێی بخات، چونکە سەرگەرمی ئیشێکی گەورەترە ! بەڵام دیارە نەپێکان (عدم إصابة) لە ئیجتیهادیشدا لەچاو پایەی بەرزی پێغەمبەری خاتەم ﷺ سەرزەنشتکردنی خوا دەخوازێ !

**مەسەلەی هەشتەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا ﴾، واتە: خوا لە هیچ کەسێك داوا ناکات، مەگەر ئەوەی لە توانایدا هەیە، ئەمە یاسایەکی چەسپاوی خوایە، ئەوە نیە کە هەر ئەوکاتە هاتبێتە خوار، بەڵکو چەندان ئایەتی دیکەشی لەسەرن، بۆ وێنە: دەفەرموێ: ﴿ فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ مَا ٱسْتَطَعْتُمْ ... ﴿١٦﴾ ﴾ التغابن، واتە: پارێز لە خوا بکەن ئەوەندەی دەتوانن، یانی: ئەوەندەی لە تواناتاندا هەیە، پارێز لە خوا بکەنو، ئەوەی لە تواناتاندا نەبوو لەسەرتان پێویست نیە، بۆ نموونە: کەسێك لە بیابانێك، لە دەشتێك، چیایەك لێی دەقەومێ، زستانە گڵ بە دەرەوە نیەو هەموو دنیا بەفر دایگرتوەو، ئاویشی لەلا نیە دەستنوێژی پێبگرێ، یاخود خۆی پێ بشوات، ئەگەر لەش پیسیی لەسەربێ، چاری چییە ؟ ئەگەر بەپێی قورئان بێ چارەسەرو تەگبیری هەیە، بەڵام بەپێی فەتوای هەندێك لەوانەبێ کە لە قورئان تێنەگەیشتوون، دەڵێن: دەبێ ئەو بەفرە بێنێ، بیتوێنێتەوەو، ئاو گەرم بکاتو، خۆی بشواتو دەستنوێژ بگرێ، یان دەبێ گڵ پەیدا بکات، جا چۆن گڵ پەیدا بکات لە کاتێکدا کە بەفر دەبارێو جاری واهەیە نیو مەتر دەبارێو نیو مەتریش ئاو بەزەوی دەچێتە خوارێ، لە کوێ بگاتە گڵی وشك ؟! بەڵام بە گوێرەی ڕواڵەتی ئایەتەکەی قورئان، فەتوای دیکە هەیە کە (صَعِید) ڕووی زەوییە، جا ڕووی زەوی بەفرە، تەرزەیە، لمو زیخە، هەرچی هەیە دەستی پێدا بێنێو تەیەمموم بکات، هەم بۆ خۆشۆردنیشو هەم بۆ دەستنوێژیش، چونکە: ﴿ لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفْسًا إِلَّا

وُسۡعَهَا ﴾، خوا لە هیچ کەس داوا ناکات، ئەوە نەبێ کە لەتوانایدا هەیە، مرۆڤ لەو کاتەدا هەر ئەوەی لە توانادا هەیەو نوێژیش نابێ بچوێنرێو دەبێ لەکاتی خۆیدا بکرێ ﴿ ... إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ كَانَتۡ عَلَى ٱلۡمُؤۡمِنِينَ كِتَٰبٗا مَّوۡقُوتٗا ﴿١٠٣﴾ ﴾النساء، بەڵێ شەریعەت خەڵکی عاسێ ناکات، بەڵام فەتوای کەسێك کە هەر لە سووچێکی شەریعەت شارەزایە، خەڵکی عاسێ دەکات، ئەگەرنا شەریعەتی فراوانیی خوای کاربەجێ، خەڵك عاسێ ناکات، چونکە خوای بە بەزەیی دەفەرموێ: ﴿ ... وَمَا جَعَلَ عَلَيۡكُمۡ فِي ٱلدِّينِ مِنۡ حَرَجٖ ... ﴿٧٨﴾ ﴾ الحج، واتە: خوا لە دیندا سەغڵەتیی بۆ ئێوە دانەناوە، هەرگیز دین خەڵکی وا سەغڵەت ناکات، نەزانێ چی بکات؟ بۆ وێنە: هەیە تووشی نەخۆشی چرکە میزە دەبێت، یان تووشی نەخۆشی دیکە دەبێ، وادەزانێ کە نوێژی بۆ ناکرێو ناگونجێ بیکات! نەخێر، بەپێی توانای خۆی پاكو خاوێنی خۆی ڕابگرێو لەو کاتەدا کە نوێژەکەی دادەبەستێ، ئەگەر هەستیش بکات دڵۆپە میزی دێ، زەرەری نیە، بەڵام دەبێ دوایی خۆی بشواتەوە، یانی چی لەتوانایدا هەیە، ئەوە بکات، چونکە ئەوی دیکە سەغڵەتییە، بڵێی: دەبێ وەك خەڵکی دیکە بکەی، ئەوەی بۆ ناکرێ، هەروەها خوا دەفەرموێ: ﴿ ... يُرِيدُ ٱللَّهُ بِكُمُ ٱلۡيُسۡرَ وَلَا يُرِيدُ بِكُمُ ٱلۡعُسۡرَ ... ﴿١٨٥﴾ ﴾ البقرة، واتە: خوا ئاسانی بۆ ئێوە دەوێو زەحمەتی بۆ ئێوە ناوێ، وە پێغەمبەر ﷺیش فەرموویەتی: {(فَإِذَا نَهَيْتُكُمْ عَنْ شَيءٍ فَاجْتَنِبُوهُ، وَإِذَا أَمَرْتُكُمْ بِأَمْرٍ فَأْتُوا مِنْهُ مَا اسْتَطَعْتُمْ) (رَوَاهُ الْبُخَارِيُّ برقم: (٧٢٨٨)، مسلم برقم: (١٨٣٠)، عَنْ أبي هُرَيرَةَ رضي الله عنه}، واتە: ئەگەر شتێکم لێ قەدەغەکردن خۆتانی لێ دووربگرن، وە ئەگەر فەرمانم بە شتێك پێکردن ئەوەندەی پێتان دەکرێ لێی ئەنجام بدەن.

**مەسەلەی نۆیەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ لَهَا مَا كَسَبَتۡ وَعَلَيۡهَا مَا ٱكۡتَسَبَتۡ ﴾، هەرکەسێك چاکە دەکا بۆخۆیەتی، خراپەش دەکات لەسەر خۆیەتی، واتە: بەهرەمەندو زەرەرمەند لە چاکەو خراپە تەنیا مرۆڤ خۆیەتی، ئەگەرنا خوا سبحانه وتعالى لەوە بەرزترە کە بە چاکەی ئێمە قازانجێکی پێ ببڕێ، یان بە

خراپەی ئێمە زەرەرێکی لێ بدرێ، لە حەدیسێکی قودسییدا کە لە (صحیح مسلم)[١]دا هاتوە، خوای پاكو تاك ڕوو لە بەندەكان دەكات، دەفەرموێ: {(يا عبادي ! لو أن أولكم و آخركم وإنسكم وجنّكم كانوا على أتقى قلبِ رَجُلٍ واحدٍ منكم، مازاد ذلك في ملكي شيئاً، يا عبادي لو أنَّ أولكم وآخركم وإنسكم وجنّكم على أفْجَرِ قَلْبِ رجُلٍ واحدٍ منكم ما نَقَصَ ذلك من ملكي شيئاً ...)}، واتە : {ئەی بەندەكانم ! ئەگەر هەر هەمووتان بە مرۆڤ و جندتانەوە بە پێی دڵی بە تەقواترین كەس بن، هیچ لە موڵكی من زیاد ناكا، وە ئەی بەندەكانم ! ئەگەر هەمووتان بە مرۆڤ و جندتانەوە بەپێی دڵی خراپترین كەس بن، هیچ لە موڵكی من كەم ناكات}، بەڵێ خوا هەر خوایە، بەڵام خوا ڕازانجی ئێمەی پێ خۆشەو، زەرەری ئێمەی پێ ناخۆشە، بۆیە ئەگەر شتێك بكەین ڤازانجمان بێ، پێی خۆشەو، ئەگەر شتێك بكەین زەرەرمان بێ، پێی ناخۆشەو لێمان تووڕە دەبێ، بەڵام لەڕاستیدا خوا بەرزو مەزن، لەوە بەرزو گەورەترە كە گۆڕانی بەسەردابێ، كردەوەی ئێمە گۆڕانی بەسەر خوای پەروەردگاردا ناهێنێ، بەڵام ئەوە مامەڵەی خوای بەرزو مەزنە لەگەڵ ئێمەدا، كە لە ئەنجامی ئەوەدا ئێمەی خۆشدەوێ بە ڤازانجمان خۆشحاڵەو بە زەرەرمان ناخۆشحاڵە، وەك دەفەرموێ: ﴿ إِن تَكْفُرُواْ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَنِىٌّ عَنكُمْ ۖ وَلَا يَرْضَىٰ لِعِبَادِهِ ٱلْكُفْرَ ۖ وَإِن تَشْكُرُواْ يَرْضَهُ لَكُمْ ...﴿٧﴾ ﴾الزمر، واتە: ئەگەر بێبڕوابن خوا لێتان بێ نیازە، بەڵام ئەگەر سوپاسگوزاربن، بۆتانی پەسند دەكات، لەبەر ئەوەی چاكەكردنەكە بۆ ئێوە ڤازانجەو، خواش ڤازانجی ئێوەی پێ خۆشەو پێی خۆشە ڤازانج بكەن، وە پێی ناخۆشە زەرەر بكەن.

**مەسەلەی دوەم:** ﴿ رَبَّنَا لَا تُؤَاخِذْنَآ إِن نَّسِينَآ أَوْ أَخْطَأْنَا ﴾، پەروەردگارمان ! لێمان مەگرە، ئەگەر لەبیرمان چوو، یان هەڵەمان كرد، یەكێ بۆی هەیە بڵێ: جا باشە ئەگەر ئینسان شتێكی لەبیر بچێ، یان بەهەڵەدا بچێ، خۆ پێویست

١) صحيح مسلم: (٢٥٧٧).

بەوە ناکات لە خوا بپاڕێتەوەو بڵێ: خوایە لێم مەگرە، چونکە خوا بەهۆی لەبیرچوونەوەوە هەر سزامان نادات، چونکە ئەوە فەرموودەی پێغەمبەرە ﷺ: {(مَنْ نَسِيَ صَلاَةً فَلْيُصَلِّ إِذَا ذَكَرَهَا، لاَ كَفَّارَةَ لَهَا إِلاَّ ذَلِكَ) (رَوَاهُ الْبُخَارِيُّ برقم: (٥٩٧)، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رضي الله عنه}، واتە: هەرکەسێك نوێژێکی لەبیرچوو (یان خەوی لێکەوتبوو) با هەرکاتێ بەبیری هاتەوە، یان هەڵسا، نوێژەکەی بکات، بەس ئەوە کەفارەتەکەیەتی. ئەدی بۆچی لێرەدا خوا کردوویەتی بە دووعای ئەو بەندانەو دەبێ داوا لە خوا بکەن کە بەهۆی لەبیرچوونەوەو بەهۆی هەڵەوە، لێیان نەگرێو سزایان نەدا ؟! ئەوە سێ وەڵامی هەیە:

١) ئەو دووعایە لە بنەڕەتدا هی پێغەمبەر ﷺو هی هاوەڵانی بەڕێزیەتی خوا لێیان ڕازیبێ لە پشتیوانانو لە کۆچکەران، کە ئەوانە لە لووتکەی هەرەبەرزی ئیماندا بوونو، کەسێك لە لووتکەی هەرەبەرزی ئیماندا بێ، لەبیرچوونەوەو هەڵەش لەسەر خۆی بە گوناح حیساب دەکات، وەك گوتراوە: (حَسَنَاتُ الأَبْرَارِ سَيِّئَاتُ الْمُقَرَّبِينَ) واتە: چاکەی چاکەکاران، خراپەیە بۆ زۆر لە خوا نزیکان، واتە: ئەوانەی زۆر لە خوا نزیکن، ئەوی دیکە کە هەر وا مسوڵمانێکی عادەتییە، ئەوەی کە ئەم دەیکات کە بۆی چاکەیە، بۆ وان بە خراپە دادەنرێ، چۆن ؟ مسوڵمانێکی عادەتی پێنج نوێژەکان دەکات، چاکی کردوە، بەڵام کەسێك کە بیەوێ زۆر لە خوا نزیك بێو، بیەوێ خەڵکی لە خوا نزیك بخاتەوەو دۆستی خوابێ، دەبێ بە فەرزەکان واز نەهێنێو، ئەگەر بە فەرزەکان واز بێنێ بۆی بە خراپە دادەنرێ ! بۆیە کاتێك پێغەمبەر ﷺ عەرەبێکی دەشتەکیی هاتوە بۆ خزمەتیو لێی پرسیوە: ئایا خوا چی لەسەر فەرز کردووین ؟ فەرموویەتی: شەوو ڕۆژێ پێنج نوێژ، دوایی فەرموویەتی: مانگی ڕەمەزان بە ڕۆژووبە، دوایی باسی زەکاتو باسی حەجی بۆ کردوە، عەرەبە دەشتەکییەکەش گوتوویەتی: چی دیکە ؟ فەرموویەتی: هەر ئەوەندە، مەگەر بۆخۆت خۆبەخشانە زیادی بکەی، گوتوویەتی: سوێند بەوەی کە تۆی بە هەق ناردوە، نە لێی کەم دەکەم نە لێی زیاد دەکەم، پێغەمبەریش ﷺ فەرموویەتی: {أفلح إن صدق} أو { دخل الجنّة إنْ

صدق}، واتە: ئەگەر ڕاست بکات سەرفرازە، یان ئەگەر ڕاست بکات دەچێتە بەهەشت، یانی: تەنیا بەوەندە دەچێتە بەهەشتێ !![1]

بەڵام هەر پێغەمبەرمان ﷺ لە فەرمایشتێکدا فەرموویەتی: {(نِعْمَ الرَّجُلُ عَبدُاللهِ، لَوْ كَانَ يُصَلِّي مِنَ اللَّيلِ) (رَوَاهُ البُخَارِيُّ برقم: (١١٥٧)، وَمسلم برقم: (٦٣٢٠)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٣٩١٩)، وَصَحَّحَهُ الألباني في (صحيح الجامع) برقم: (٤٢٨٢)}، واتە: عەبدوڵلا (ی کوڕی عومەری کوڕی خەتتاب) پیاوێکی زۆر باشە، ئەگەر شەونوێژی بکردایە، دیارە عەبدوڵلا لەدوای ئەوە شەو نوێژی نەفەوتاندوە، گوتوویەتی: مادام بەوە ببمە پیاوی باش، شەونوێژ نافەوتێنم، کەواتە: بۆ کەسانێك ئاستی بەرزیان لە ئیماندا هەبێ، ئەگەر لەو ئاستە بەرزە بێنە خوارێ، وەك بڵێی گوناهیان کردبێ، چونکە خوای پەروەردگار لە سوورەتی (المؤمنون)دا ئاوا باسی ئەو بەندە نایابو هەڵبژاردانەی خۆی دەکات، دەفەرموێ: ﴿وَٱلَّذِينَ يُؤۡتُونَ مَآ ءَاتَواْ وَّقُلُوبُهُمۡ وَجِلَةٌ أَنَّهُمۡ إِلَىٰ رَبِّهِمۡ رَٰجِعُونَ ﴿٦٠﴾﴾، واتە: وە ئەوانەی هەرچی لە توانایاندایە دەیکەن، وە دڵیشیان لە خورپەدایە کە دەگەڕێنەوە بۆ لای پەروەردگاریان، هەرچی لەدەستیان هاتوە لە چاکە کردوویانە، کەچی دڵیشیان هەر لە ڕاچەڵەکین دایەو، لە خۆیان ئەمین نین، ئەمە وەڵامێکیان.

٢) وەڵامێکی دیکە ئەوەیە کە دەگونجێ مەبەست لە (نسیان) لێرەدا (تَرْك)بێ، واتە: وازلێهێنان، وە مەبەست لە (خَطَأ)یش، گوناح (خطیئة)بێ، کەواتە: مانایەکەی ئاوای لێدێ پەروەردگارمان ! ئەگەر شتێکمان وازلێهێنا، {وەك دەفەرموێ: ﴿...نَسُواْ ٱللَّهَ فَنَسِيَهُمۡۚ ...﴿٦٧﴾﴾ التوبة، واتە: ئەوان خوایان فەرامۆش کرد خواش ئەوانی فەرامۆش کردو وازی لێهێنان}، لەو کردەوە چاکانەی لەسەرت پێویست کردووین، یاخود گوناهێکمان کرد، لەوانەی لێت

---

١) صحيح البخاري: (١٨٩١).

قەدەغە کردووین، لێمان ببوورە، ئەوە وەڵامی دووەم.

٣) وە دەگونجێ مەبەست لە لەبیرچوونەوەو بە هەڵەداچوون، ئەو هۆکارانە بن کە سەردەکێشن بۆ ئەوەی ئینسان شتی لەبیربچێتەوە، یاخود بە هەڵەدابچێ، واتە: ئینسان دەبێ کارەکانی خۆی بە بایەخ بگرێ، ئەگەرنا گوناهبار دەبێ، بۆ وێنە: کابرا نیو سەعاتی ماوە نوێژی بەیانی بچێ، بڵێ: با هەندێك بنووم، دیارە هەموو کەس دەزانێ ئەو نیو سەعاتە بخەوێ، نوێژەکەی دەچێ، بەڵێ بەهۆی خەوتنەوە بووە، بەڵام کەمتەرخەمیی هەبووە، یان کەسێك شتێك پشتگوێ دەخات و لەبیرخۆی دەباتەوە، یاخود کارێك هەندێ پێشەکی هەن، دەبنە هۆی لەبیرچوونەوەو بەهەڵەداچوون، ئەوانە دیارە لێپرسینەوەیان لەسەرە، لەوبارەشەوە ئەو فەرمایشتەی پێغەمبەر هەیە ﷺ کە فەرموویەتی: {(إِنَّ اللَّهَ تَجَاوَزَ عَنْ أُمَّتِي الْخَطَأَ وَالنِّسْيَانَ وَمَا اسْتُكْرِهُوا عَلَيْهِ) (رَوَاهُ ابْنُ مَاجَهْ بِرقم: (٢٠٤٥)، وَابْنُ حِبَّانَ بِرقم: (٧٢١٩)، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنه، وَصَحَّحَهُ الألباني في (المشكاة) برقم: (٦٢٩٣)}، واتە: بێگومان خوا لە ئوممەتی من چاوپۆشیی کردوە، لە هەڵەو لەبیرچوون، وە ئەوەی کە بەزۆر پێیان بکرێ.

**مەسەلەی یازدەیەم:** کە دەفەرموێ: ﴿رَبَّنَا وَلَا تَحۡمِلۡ عَلَيۡنَآ إِصۡرٗا كَمَا حَمَلۡتَهُۥ عَلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِنَا﴾، وە پەروەردگارمان! قورساییەکمان مەخە سەرشان وەك چۆن خستووتە سەرشانی ئەوانی پێش ئێمە، با تەماشای ئەو دوو ئایەتە بکەین، تاکو مەبەستی ئەو ئایەتەمان بۆ ڕوون بێتەوە، خوا دەفەرموێ:

﴿فَبِظُلۡمٖ مِّنَ ٱلَّذِينَ هَادُواْ حَرَّمۡنَا عَلَيۡهِمۡ طَيِّبَٰتٍ أُحِلَّتۡ لَهُمۡ وَبِصَدِّهِمۡ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ كَثِيرٗا ﴿١٦٠﴾ وَأَخۡذِهِمُ ٱلرِّبَوٰاْ وَقَدۡ نُهُواْ عَنۡهُ وَأَكۡلِهِمۡ أَمۡوَٰلَ ٱلنَّاسِ بِٱلۡبَٰطِلِۚ وَأَعۡتَدۡنَا لِلۡكَٰفِرِينَ مِنۡهُمۡ عَذَابًا أَلِيمٗا ﴿١٦١﴾﴾ النساء، واتە: جا بەهۆی ستەمکردنی جوولەکەکانەوە هەندێك ڕزق و ڕۆزی پاك و خۆشمان لێ قەدەغەکردبوون، وە

بەهۆی زۆر خەڵك لادانیان لەڕێی خوا، وە بەهۆی ئەوەوە كە ڕیبایان وەردەگرت، هەرچەندە لێشیان قەدەغە كرابوو، وە ماڵی خەڵكیان بە ناهەق دەخوارد، وە ئەوانەی كە بێبڕوان لەوان سزایەكی بەئێشمان بۆ داناون.

هەروەها خوای دادگەر دەربارەی جوولەكەكان دەفەرمویٚ: ﴿كُلُّ ٱلطَّعَامِ كَانَ حِلًّا لِّبَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ إِلَّا مَا حَرَّمَ إِسۡرَٰٓءِيلُ عَلَىٰ نَفۡسِهِۦ مِن قَبۡلِ أَن تُنَزَّلَ ٱلتَّوۡرَىٰةُ ...﴿٩٣﴾﴾آل عمران، واتە: هەموو خواردنەكان {هەموو جۆرە گۆشتەكان، (طعام) لێرەدا مەبەست گۆشتە} بۆ وەچەی ئیسڕائیل حەڵاڵ بوون، جگە لەوەی كە ئیسڕائیل {كە نازناوی یەعقووبە ﷺ} لە خۆی قەدەغە كرد بوو بەر لە دابەزینی تەورات، چی لەخۆی قەدەغەكرد بوو ؟ گۆشتی حوشتر، یەعقووب گۆشتی حوشتری زۆر پێ خۆش بوو، داوایەكی هەبوو لە خوای پەروەردگار گوتی: پەروەردگارم ئەو شتەم بۆ بكە من گۆشتی حوشتر ناخۆمو لە خۆمی قەدەغە دەكەم، وە لەسەر وەچەی ئیسڕائیلیش قەدەغەكرا، كەواتە: بۆخۆی لەخۆی قەدەغەكردبوو، وە جاری وابوو جوولەكەكان هەڵەیەكیان دەكرد خوای زاناو توانا شتێكی لێ قەدەغە دەكردن، وەك سزادان: وەك لەم ئایەتەدا دەفەرموێ: ﴿وَعَلَى ٱلَّذِينَ هَادُواْ حَرَّمۡنَا كُلَّ ذِي ظُفُرٖۖ وَمِنَ ٱلۡبَقَرِ وَٱلۡغَنَمِ حَرَّمۡنَا عَلَيۡهِمۡ شُحُومَهُمَآ إِلَّا مَا حَمَلَتۡ ظُهُورُهُمَآ أَوِ ٱلۡحَوَايَآ أَوۡ مَا ٱخۡتَلَطَ بِعَظۡمٖۚ ذَٰلِكَ جَزَيۡنَٰهُم بِبَغۡيِهِمۡۖ وَإِنَّا لَصَٰدِقُونَ ﴿١٤٦﴾﴾الأنعام، واتە: لەسەر جوولەكەكان هەموو خاوەن نینۆكێكمان قەدەغەكردبوو {هەموو ئەو باڵندانەی نینۆكیان هەیە وەك: (مراوی، قاز، مریشك، كۆتر... هتد)} وە لە مانگاو لە مەڕیش بەزو چەورییەكانیانمان قەدەغەكردبوو جگە لەوەی كە بە پشتیانەوە دەنووسێ {لێی نابێتەوە}یان ئەوەی لەنێو ڕیخۆڵەكانیاندا هەیە، یان ئەوەی تێكەڵ بە ئێسقان بووە، ئەوە بەهۆی لادانو سنوور شكێنییان ئاوا سزامان دان، وە بێگومان هەر ئێمە ڕاستگۆین.

جا ئەو دووعایەی مسوڵمانان دەڵێ: پەروەردگارمان! ئەو بارە قورسەی کە خستبووتە سەرشانی ئەوانەی پێش ئێمە {بەهۆی هەڵەکانیانەوە}، ئەوە مەخەرە سەرشانمان، جا ئەگەر چەند وێنەیەك لە یاساکانی تەورات بێنینەوە[1] زیاتر بۆمان دەردەکەوێ، شەریعەتی ئیسلامیی چەند ساناو سەهلە، لەچاو هەندێ لە حوکمەکانی تەورات.

دیارە وەك چۆن قورئان سوورەت سوورەتە، وە هەر سوورەتەی چەند ئایەتێکە، تەوراتیش چەند سیفرێکە{(أسفار) کۆی (سِفْر)ە، (سِفْر)یش واتە: کتێب}، وە هەر کتێبێکیش چەند (إصحاح)ێکەو هەر (إصحاح)ێکیش، کە وەك سوورەتە چەند ئایەتێکە، بۆ وێنە:

١/ لە (سِفْر الخروج) (إصحاح)ی (٢١) ئایەتی (١٥) دا هاتوە: (وَمَنْ ضَرَبَ أَبَاهُ أَوْ أُمَّهُ يُقْتَلُ قَتْلاً) واتە: هەر کەسێك لە بابی بدا، یان لە دایکی بدات دەبێ بکوژرێ.

٢/ وە لە ئایەتی (١٦)دا هاتوە: (وَمَنْ سَرَقَ إِنْسَاناً وبَاعَهُ أَوْ وُجِدَ فِي يَدِيهِ يُقْتَلُ قَتْلاً) واتە: هەرکەسێك شتێکی لە کەسێك دزیو فرۆشتی، یاخود لە لای دۆزرایەوە، دەبێ بکوژرێ.

٣/ وە لە ئایەتی (١٧)دا هاتوە: (وَمَنْ شَتَمَ أَبَاهُ أَوْ أُمَّهُ يُقْتَلُ قَتْلاً) واتە: هەر کەسێك جنێویدا بە بابی یان بە دایکی، دەبێ بکوژرێ.

٤/ وە لە ئایەتی (٢٨)دا هاتوە: (وَإِذَا نَطَحَ ثَورٌ رَجُلاً أَوْ امْرَأَةً فَمَاتَ يُرْجَمُ الثَّوْرُ وَلاَ يُؤكَلُ لَحْمَهُ وَأَمَّا صَاحِب الثَّور فَيَكُونُ بَرِيئَاً) واتە: ئەگەر گایەك قۆچی لە پیاوێك هەڵدا، یان لە ئافرەتێكو ئەو کەسە مرد، گایەکە دەبێ بەرد باران بکرێو گۆشتەکەیشی ناخورێ، بەڵام خاوەنی گایەکە بەرییە.

---

١) بڕوانە: (التفسير التطبيقي للكتاب المقدّس) العهد القديم، ص: (١٧٥، ١٧٦) بەڵام بە پێی جیاوازی چاپەکان (طبعات) ئایەتو ڕستەکان جیاوازییان هەیە.

٥/ وە لە (سِفْر العدد)[١] (إصحاح)ی (١٩) لە ئایەتی (١١)دا هاتوە: (مَنْ مَسَّ مَيْتاً مَيْتَةَ إِنْسَانٍ، يَكُون نَجِساً سَبْعَةَ أَيَّامٍ) واتە: هەر کەسێك دەست لە مردوویەکی مرۆڤ بدات، حەوت ڕۆژان بە پیس لەقەڵەم دەدرێ.

٦/ وە لە ئایەتی (١٣)دا هاتوە: (كُلُّ مَنْ مَسَّ مَيِّتاً مَيتَة إِنْسَان، قَدْ مَاتَ، وَلَمْ يَتَطَهَّر و دخل مسكن الربّ، يُنَجِّسُ مَسْكَن الرَّبِ فَتُقْطَعُ تِلْكَ النَّفْسُ مِنْ بَنِي إِسْرَائِيل) واتە: هەر کەسێك دەست لە مردوویەك بدا، وە دوایی خۆی نەشواتەوەو بێتە ماڵی خوا (بێتە مزگەوتێ) ئەوە ماڵی خوا پیس دەکاتو دەبێ بکوژرێ.

٧/ ئنجا هەر لە (سِفْر العدد) (إصحاح)ی (٣٥) لە ئایەتی (٣١)دا هاتوە[٢]: (وَلاَ تَأخُذُوا فِدِيَةً عَن نَفْسِ القَاتِلِ المُذنِبِ لِلْمَوتِ بَلْ إِنَّهُ يُقْتَلُ) واتە: فیدیە وەرمەگرن لە کەسێك کە نەفەرێکی کوشتوە، بەڵکو دەبێ بکوژرێتەوە، (واتە: خوێنی لێوەرمەگرن).

٨/ ئنجا دەربارەی ئافرەت لە (سِفْر اللاّويين) لە (إصحاح)ی (١٥) لە ئایەتی (١٩)دا، لە (نجاسة طمث المرأة)دا هاتوە[٣]: (وَكُلُّ مَنْ مَسَّهَا يَكُونُ نَجِساً إِلى المَسَاء) واتە: وە هەرکەسێك دەست لە ئافرەتێکی حەیزدار بدات، هەتا ئێوارێ بە پیس لەقەڵەم دەدرێ. {جا کە بە پیسیش لەقەڵەم دراوە، دیارە کۆمەڵێك شتی لێ قەدەغە بووە}، وەك لە ئایەتی (٢٠)دا دەڵێ: (وَكُلُّ مَا تضطجِعُ عَلَيهِ فِي طَمْثِهَا يَكُونُ نَجِساً وَكُلُّ مَا تَجْلِسُ عَلَيهِ يَكُونُ نَجِساً) واتە: هەر شتێك ئافرەتی حەیزدار لەسەری ڕاکشێ، یان لەسەری دانیشێ بەپیس لەقەڵەم دەدرێ (یانی: دەبێ بشۆرێتەوە)، وە لە ئایەتی (٢١)دا دەڵێ: (وَكُلُّ مَنْ مَسَّ فِرَاشَهَا يَغسلُ ثِيابهُ وَيَستحِمُّ بِمَاءٍ وَيَكُونُ

---

١) هەمان سەرچاوە، ص: (٣١٥).

٢) هەمان سەرچاوە، ص: (٣٤٩).

٣) هەمان سەرچاوە، ص: (٢٤٣).

نَجِساً إِلى المَسَاء) واتە: هەر کەسێك دەست لەو شوێنە بدات کە ئافرەتی حەیزدار لەسەری دانیشتوە، دەبێ دوایی بەرگەکانی خۆی بشواو بە ئاوێك خۆی بشواتەوەو، هەتا ئێواریش بە پیس لەقەڵەم دەدرێ.

ئەوانە کۆمەڵێك یاسای قورس بوون، کە بە زۆری بەهۆی سەرپێچییەکانی خۆیانەوە، خوای دادگەر لەسەری پێویست کردوون.

**مەسەلەی دوازدەیەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ رَبَّنَا وَلَا تُحَمِّلْنَا مَا لَا طَاقَةَ لَنَا بِهِۦ ﴾، وە پەروەردگارمان ! شتێکمان لێ داوا مەکە کە لە توانامانـدا نیە، مەبەست پێی بەڵاو گرفتارییەکانن کە بەسەر ئینسان دێن، ئەوەی پێشێ کە دەفەرموێ: ﴿ رَبَّنَا وَلَا تَحْمِلْ عَلَيْنَآ إِصْرًا كَمَا حَمَلْتَهُۥ عَلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِنَا ﴾، ئـەو دووعایە بۆ لابردنی ئەرکە قورسە شەرعییەکانەو، ئەمەش بۆ لابردنی ئەو بەڵاو گرفتارییانەیە، کە بەسەر ئینسان دێن‌و، لە توانای ئینسان بەدەرن.

**مەسەلەی سێزدەیەم:** گرنگیی‌و گەورەیی ئەم دوو ئایەتە:

١) پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {(مَنْ قَرأَ بالآيَتَيْنِ مِنْ آخرِ سُورَةِ البَقَرَةِ فِي لَيْلَةٍ كَفَتَاهُ) (رَوَاهُ أَحْمَدُ بِرقم: (١٧٠٣٣)، وَالبُخَارِيُّ بِرقم: (٥٠٠٩)، وَمُسلم بِرقم: (١٨٧٧)، وَأَبُو دَاوُدَ بِرقم: (١٣٩٧)، وَالتِّرمِذِيُّ بِرقم: (٢٨٨١)، وَابْنُ مَاجَهْ بِرقم: (١٣٦٩)، وَابْنُ حِبَّانَ بِرقم: (٧٨١) عَنْ أبِي مَسْعُودٍ رضي الله عنه}، واتە: هەر کەسێك دوو ئایەتان لە کۆتایی سوورەتی بەقەرە لە شەوێدا بخوێنێتەوە، بەسی، واتە: بۆی وەبەر شەونوێژ دەکون، بەپێی ڕای هەندێك لە زانایان، بەڵام هەندێکی دیکە دەڵێن: نەخێر یانی بەسیەتی کە هەر بەڵاو دەردێکی لێ لابدەن، یاخود ئەگەر مرد، بەسنی بۆ ئەوەی بە ئیمانەوە بڕوات.

٢) هەروەها ئەم فەرموودەیەش لەوبارەوە هەیە: {(عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنه قَالَ: بَيْنَمَا رَسُولُ اللهِ ﷺ وَعِنْدَهُ جِبْرِيلُ عليه السلام إِذْ سَمِعَ نَقِيضاً فَوْقَهُ، فَرَفَعَ

